ڕۆمانی تەلەفزیۆنیی:

# بەختەباران

## چیرۆکی پۆلیسیی

نووسین و سیناریۆی: ئەحمەد ڕەزا

دیمەنی – ١ – ڕ- عەسری درەنگ/ د – بەردەمی چایخانەکە:

(( أ- چایخانە، دوکانێکە لای خوارووی کۆمپانیای زوبێرو دارەوانەوە، کۆمپانیاکە ڕووی کردووەتە شەقامی سەرەکی.. گوزەرێکە دەرگای چەند تەلارێکی ئەکەوێتە سەر، کە یەکێکیتریان کۆمپانیای ڕێشارە، کە دەرگاکەی لەسەر شەقامە سەرەکییەکەیە.. چەند دوکانێکیتر هەیە لەناو کۆڵانەکەدا، بە هەموو گوزەرەکە پێک ئەهێنن.

ب - ئەردەلانی تەمەن ٤٥ ساڵان.. جلوبەرگێکی خۆڵاویی و تۆزاویی لەبەردایە، حەماڵە، عەرەبانەیەکی لە بەردەمدایە، یاری بە چەند وردە بەردێک ئەکاو هەڵی ئەدات و ئەیگرێتەوەو لێی ئەکەوێ و بە جددی بۆی ئەگەڕێت و هەڵیئەگرێتەوەو بەردەوامە لە یاری پێکردنی.

ج - خدری حەماڵ تەمەن ٣٥ ساڵان، بە هەمان شێوە جلوبەرگی حەماڵیی لەبەردایە، بەهۆی زستانەکەوە، قەمسەڵەیەکی کۆنیشی لەبەر هەڵکێشاوە، ئەسڵەعە، سمێڵ تاشراو.. لەناو کۆڵانەکەوە دێت بە عەرەبانەکەیەوە، کە بارێکی لەسەرەو بەرەو شەقامە گشتییەکە، ئەچێت و لەچاو ون ئەبێ.

د- دواتر دارەوان پیاوێکی کەشخەو سمێڵ پانی تەمەن ٦٠- ٦٥ ساڵان بە چاکەت و پانتۆڵەوە دێتە ناو دەمی دەرگای کۆمپانیای زوبێر))

دارەوان: ئەوە حەمەخدر لەکوێیە ئەردەلان ؟

ئەردەلان: ئێستا لێرەوە ڕۆشت کاک دارەوان باری گەورەی هەبوو.. من بێم؟

دارەوان: نا تۆ مەیە ئەمخەیتە شەو، حەمەخدرم بۆ بدۆزەرەوەو بۆم بنێرە (( ئەچێتەوە بۆ ژوورەوە))

ئەردەلان: بەڵێ بەسەرچاو! (( بەردەوام ئەبێتەوە لە یاری کردن بە بەردەکان))

(( پاش کەمێک خدر دێتەوەو ئەردەلان پێی ئەڵێت کە دارەوان ئیشی پێی بووەو ئەویش بە پەلە عارەبانەکەی جێ ئەهێڵێت و بەرەو کۆمپانیاکەی زوبێرو دارەوان ڕا ئەکا))

ئەردەڵان: هێواش هێواش ملی خۆت ئەشکێنی.

(( پاش کەمێک سەرەی تەمەن ٣٠- ٣٥ ساڵان بە جلی کوردیی و قەمسەڵەوە بە پۆزەوە دێت.. ڕیشی هەیە، سەری ڕووتە، دوو سێ ئەنگوستیلەی گەورەی لە دەستتدایە، تەسبیحێکی ئەبڵەقی درێژی بە دەستەوەیە، هەواڵی حەمە خدر لە ئەردەڵان ئەپرسێ))

ئەردەڵان: وەڵا کاکە سەرتیپ گیان ئیشی زۆر بوو، ئەوە کاک دارەوان ناردویێتی بەشوێنیا بۆ ئیش خوا ئەزانێ کەی دێتەوە، ئەگەر بارت هەیە من بێم؟

سەرە: عەمری تۆ نەمێنێ گەلحۆ، تۆم بۆچییە؟ کە هاتەوە پێی بڵێ سەرە ئەیوت باری لۆرییەکمان بۆ دێت بە پەلە دایگرێ و بیخاتە مەخزەنەکەوە.

ئەردەڵان: دە توخوا با منیش لەگەڵیابم کاکە سەرتیپ!

سەرە (( بەدەم ڕۆشتنەوە)): بەخۆی بڵێ. (( ئەڕوات))

ئەردەڵان: ئەی بەر نەعلەتی خواکەون باشە؟ هەتیو وا ئەزانن من ڕۆژانە بۆ هەڵماقۆ دێم بۆ ئێرە.. دە ئاخر تۆزێ ویژدانتان بێ هەی کوڕی کەرو سەگ و مەیمونانە! منیش پێویستیم بە پارەیە، هەر خدر خدر خدر، خوا لە ناوی دەمی خدریش با ئاوا، هەی هەزارجار.. لەوەتای ئەو هەتیوە هاتووە، ڕسقی منی بڕیوە.

هاوڕێ (( لە دەمی چایخانەکەوە)): ئەردەڵان!

ئەردەڵان: کورە وەی زەهری مار، چییە تۆش ئیشت بە حمەخدرە؟

هاوڕێ (( پێکەنین.. تەمەن نزیکەی ٣٠ساڵێک، شەرواڵ و قەمسەڵە، چایچییە)): نا نا ئیشم بەو نییە.. ئەڵێم لەفەیەک ماوە با خەسار نەبێ، محە ناشوکر لێرە نییە، با نەیڕێژم.. بۆ نایخۆی؟

ئەردەڵان: بۆم بکە بە سەفەریی، شەو لە کاولەکەم ئەیخۆم.

(( پاش کەمێک خدر بەدوای دارەواندا دێتە دەرەوە فەردەیەکی بە شانەوەیەو ئەیبا بەرەو سەیارەی دارەوان))

دارەوان(( بەدەم ڕێوە)): کە گەڕایتەوە بیرت نەچێ باش دەرگاو مەرگای دەرەوە جوان داخەی.

خدر: بەسەرچاو کاکە دارەوان، ئەی مامۆستا زوبێرو کاکە ڕێژوان نایەنەوە؟

دارەوان: نا نایەنەوە.

ئەردەڵان(( بەتەوسەوە)): ئەوە سەرەش ئەیوت با بێ ئیشم پێیەتی، لۆرییە لۆری.. بەو خوایە نەهێڵی لەگەڵتا دایگرم، مەپرسە چی ئەکەم!

خدر: باشە باش کاتی نییە، ئێستا دێمەوە.

(( خدرو دارەوان بەرەو شەقامە گشتییەکە ئەچن))

ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ٢ – مربوط – ڕ – عەسر/ د – بەردەمی کۆمپانیای ڕێشار:

(( أ- ڕێشار گەنجێکی جوان، تەمەنی ٤٠- ٤٥ ساڵێک، ڕانک و چۆغەی شاڵ و ئەنگوستیلەی گەورەی ئاڵتون و تەسبیحی دەنک گەورە، قەمسەڵەی داوە بە شانیدا، ڕیشی هەیە، فشەکەر.. کرمانج هێمنە، جانتاکەی بۆ هەڵگرتووەو ملکەچییەتی، کراس و پانتۆڵ و قەمسەڵە، تەمەنی ٣٨ – ٤٤ ساڵێک، سمێڵێکی کورتی هەیە.. مالە هاوشێوەی سەرە، بە هەڵسوکەوت و جلوبەرگا، خۆدەرخەرو باڵ فشکردنەوە.

ب- سەرەو مالە دێنە دەرەوەو ڕێشار وەک ئەوەی مەسئول بێ و ئەوان پاسەوان بەدوایاندا.. کرمانج لە دوایەوە جانتای بۆ هەڵگرتووە.

ج- ڕێشار چاوی بە دارەوان و خدر ئەکەوێت پەست ئەبێ و مۆڕە لە دارەوان ئەکا بە گرژی قسە ئەکا.. دارەوان تەماشای ناکا ))

ڕێشار(( بۆ خدر)): هەتیو پێیان نەوتی بارێکمان هەیە دایگری؟

خدر(( فەردەکەی دارەوانی بە شانەوەیە)): بەڵێ کاکە ڕێشار گیان، لە خزمەتدام.

ڕێشار: خۆت مەشغوڵ نەکەی بەملاولاوە ئەوە پێموتی. (( دارەوان لە ژێرەوە تەماشایەکی پڕ ڕقی ئەکا)).

خدر: خەمت نەبێ کاکە ڕێشار گیان هەر کە گەیشت، لەگەڵ خۆما. ئەحەو کارەی برازام و ئەردەلانیشی ئەخەمە سەر، لە چاوتروکانێکا دایئەگرین.

(( مالە دەرگای سەیارەکەی بۆ ئەکاتەوەو ڕێشار لە پێشەوە سوار ئەبێت و کرمانج ئەبێ بە شۆفێر.. سەرەو مالەش لە دەرەوە ئەمێننەوە ))

ڕێشار: لە ماڵەوەم مالە، هەر شتێک هەبێت.

مالە: لە خزمەتتاین گەورەم.

Cut

دیمەنی – ٣ – ڕ- ئێوارە/ن – ماڵی زوبێر:

(( ماڵی دەوڵەمەندێک.. وێنەیەکی زوبێر بەگەورەیی هەڵواسراوە.. زوبێر. تەمەن ٥٥-٦٠ ساڵ.. پیاوێکی بە هەیبەت و قۆز، زۆر هێمن، بە چاکەت و بیجامەوە، بلوزێکی لە ژێرەوە لەبەرایە، چیمەنی تەمەن ٣٠- ٣٣ ساڵان، جوان و پۆشتەوپەرداخ، بە جلی ماڵەوە، تەماشای چاکەتێکی باوکی ئەکا))

چیمەن: ئەم چاکەتە ئەنێرم بۆ ئوتو باوکە، پیس بووە.

زوبێر: خۆشم هەستمکرد.. وامدانابوو پێت بڵێم بیرم چوو.

چیمەن: ئەوە بە ڕێژوانم وت ئێوارە بێتەوە چێشتم لێناوە، کەچی نەهات.

زوبێر: با بچێتەوە بۆ ئەولا کوڕەکەی دایکی، هیچ بانگی مەکە.

چیمەن: جا بەخوا زۆر باشە لای دایکمە باوەگیان.. ئەی ئەگەر ئەو لەوێ نەبووایە؟

زوبێر: کەیفی خۆیەتی، مادام کێشەو بەڵاکانیم لەکۆڵ بۆتەوە، ئیتر چۆن ئەیگوزەرێنن، بە دڵی خۆیان بکەن.

چیمەن: هەست ناکەی کەمێکیش دڵت ڕەق بێ باوکە؟

زوبێر: نا چیمەن گیان، لە بنەڕەتەوە من و دایکت بۆیە جیابووینەوە، کێشەمان زۆر بوو.. باشە.. ئێستا، کە دایکتم بیر بکەوێتەوە، بە کێشەکانییەوە ئامادەیە.. جا بۆ ئەوەی خۆم لە کێشەکانی بدزمەوەو بیرم نەکەوێتەوە.. ناچارم دایکت لە بیری خۆم ببەمەوە.

چیمەن: ئەزانم کە لەگەڵ خەڵکیترا میانەت نامێنێ، دیلیتی ئەکەیت و ئیتر بیرت ناکەوێتەوە.

زوبێر: دایکیشت هەر ئەویترە باوانم.. چیمەن گیان بۆ ژیانی خۆت تۆش ئەوە بکەی باشە.. بۆ ئەوەی شتەکان تێکەڵ و پێکەڵ نەکەی، هەر شتەو هەر کەسەو هەر

دیاردەیەک، لاپەڕەیەکی مێشکتی بدەرێ.. زانیت هەر کامێکیان بایەخدارترە، گرنگیی زیاتری بدەرێ.

چیمەن: تۆ باوکێکی زۆر گەنجی، ئەزانی من چەند چانسم هەبوو لە ژیانا کە تۆ باوکمی؟ هەر ڕۆژەو وانەیەکی نوێ و بیرۆکەی تازە.

زوبێر: کچم بە ڕاستی گەر وانەکەیت فریای هیچ ناکەوی.. مرۆڤ لەم تۆزە ژیانەدا کە ئەیگوزەرێنین، بەشی خۆی ناکا، ئەی چۆن بەشی خەڵکیتری پێ ئەدرێ.

چیمەن: ئەوە کەمێک ڕەشبینییە باوکە.. لەگەڵتا نیم.

زوبێر: هاهاها جاچییە؟ خۆ من بۆ ئەوە قسەت بۆ ناکەم تا ملکەچتکەم و هەموو شتێکی منت بە دڵ بێ.. تۆش وەکو من بوونەوەرێکی دابڕاوی لە سروشتدا.. چۆن بیر ئەکەیتەوە ئەوە زاڵترینە کچم.

Cut

دیمەنی – ٤ – ش / ن- ماڵی دارەوان:

(( ماڵی دەوڵەمەند.. وێنەیەکی دارەوان و یەکێکی نارەوەن بە گەنجی لای یەکەوە هەڵواسراون.. نارەوەن ژنێکی کامڵی سەروو ٥٠ ٥٥ ساڵ، پۆشتەوپەرداخ.. لەگەڵ تیرۆژی تەمەن ٢٢-٢٥ ساڵانی جوانی کچیدا دانیشتوون، کە خەریکی سەعی کردنە.))

نارەوەن: ئەوە تیرۆژ، ئەو خوشکە قژ هەڵپاچراوەکەت بۆ دیار نییە؟ قسەت لەگەڵ نەکرد؟.. یاان تۆش دوو ڕۆژیتر شووت کرد، لەو خراپتر ئەبی بەخوا.

تیرۆژ: ئەرێ دایکە گیان تۆ مۆبایلەکەت لە خەتی بەری دەستت زیاتر ئەبینرێ لە دەستا ، با جارێکیش بۆ ئەو بێت و خۆت پێی بڵێ.. من چووزانم..

نارەوەن: من هەواڵی بپرسم و بیری بخەمەوە؟؟؟؟؟ ئەک حەددی نەبێ.

تیرۆژ: ئەرێ دە ئەویش چی بکا؟ با قاوەخانەتان بۆ دانەنایەو وەک جاران هەموو شەوێ سەرو دڵی بگرتنایە.. ئەرێ ئێوە نە بەیەکەوەو نە بێ یەک، ئیدارە ناکەن؟

نارەوەن: دەی وەرە قسە بۆ منالی ئەم سەردەمە بکە.. بابە من هیچ!!! .. با تەلەفونەکەم بکەم.

تیرۆژ: هههە دیسان تەلەفون، نارەوەن خان؟

(( پاش کەمێک خۆ سەرقاڵکردن بە مۆبایلەوە.. نارەوەن تێل ئەکا))

نارەوەن (( بە مۆبایل، کەمێک گرژ)): ئەوە بۆ نایەیتەوە دارەوان ئەفەنی؟! ..... دەی کە خۆت ئاوا درەنگ بێیتەوە، بۆشت نییە لە کوڕەکان بپرسیتەوە!!........ تۆ لە کۆمپانیای، ئەوانیش لە دوکانن..!! ئەی چی؟ .... توخوا ئەوە ئیشی من بووایەو پێم بوتیایە ئەتکرد؟ کورە نەبەخوا..... دە باشە دەی زوو وەرەوە، ئیش نەبڕایەوە؟! وا تێل بۆ ئەوانیش ئەکەم (( دایئەخاتەوە)) ئیتر شەوم لێدێت ئەبێ لە سۆراخی منال و مێردا بم.. وەڵاهی ئەمە حاڵ نییە منی تیام!!!

تیرۆژ: خەتای خۆتە.. خۆت هیچ ناڵێی، ئێستا کوا وەختی دوکان ماوە، خوا ئەزانێ لە کوێن؟ بەس بۆ منی داماو ئازای هەر ناوێرم بچمە بەر دەرگاش؟

نارەوەن: تۆش بیبڕەوە زۆر دڵم خۆش نییە، مەگەر هەر گوێ لە بۆڵەی تۆ بگرم؟! (( تێل ئەکاتەوە.. گرژ)) ئەوە لە کوێی ئاوە حەوت دان؟! ... خێرا وەرەوە باوکت ئەیوت بێمەوەو لە ماڵ نەبن ئەیانکوتم..... کەیفی خۆتانە ئەوە پێم وتی، بە کاکە ئامۆشت بڵێ.. دەی دەستوبردکەن...... بەڵێ دوکان داخەن و وەرنەوە، وا نیوەشەوە.

تیرۆژ: باوەڕ ناکەم... توخوا باوکم وتی ئەیانکوتم؟ هههە.

نارەوەن: باوکت خۆی یەکێکی ئەوێ بیکوتێ.. هەستە ئەو قوزەڵقورتەیان بۆ گەرمکەوە، ئێستا دێنەوە لاکەی سکیان دێت لە برسا!

(( تیرۆژ، بەدەم ئۆف و ئاخەوە کتێبەکەی بە توڕەیی لەسەر ئەو شوێنەی سەعی تیا کردووە دائەنێت و ئەچێتە دەرەوە، نارەوەن خەریکی مۆبایلە))

نارەوەن: ئۆی چۆنی ناسکە خان گیان.........

Cut

دیمەنی – ٥ – ش / ن – دوکانی بلیارد:

(( ئاوای تەمەن ٢٨- ٣٠ ساڵێک، گەنجێکی جوان جلی کەسێکی دوکانداریی لەبەرە، مۆدێلبازیی پێوە دیارە، بلیارد ئەکا.. کەسێک دێتە لایەوە))

کەس: کاک ئاوا کاک ئامۆی برات هاتووە بە دواتا.

ئاوا: پێی بڵێ بابێتە ژوورەوە، هەر ئەم یارییەم ماوە.. (( کەسەکە ئەڕوات و ئاوا بۆ بەرامبەرەکەی)) تا چاو پیسیی زیاتر بکەی من براوەترم با بزانی. هههە.

بەرامبەرەکەی: ئەهااااا سەیریکە پانزەکەی چۆن بۆ هاتۆتەوە، چۆتە سەر دەمی کونەکە.. ئەوەیە شانس!

ئاوا: شانس نییە ڕۆڵە، لێزانینە لێزانین (( ئامۆی تەمەن ٣٢- ٣٤ ساڵ دێتە ژوورەوە، گەنجێکی بە ویقارو شیک، جلی سەردەمی بە جوانترین شێوە پۆشیوە)) ئامۆ هاتی؟

ئامۆ: دە درەنگە لەکەیەوە تەلەفونی بۆ کردووی؟

ئاوا: وا هاتم، ئەها ئەوەندەم نەماوە، یەک تۆز تەحەمول.

(( ئامۆ خۆی سەرقاڵ ئەکات و ئاواش یاریی ئەکا.

باشتر وایە ئسوڵی یارییەکەو زاراوەکانی لەو شوێنە بپرسرێ کە بلیاردەکەی لێیە))

Cut

دیمەنی – ٦ – ش/ د – ژێر قادرمەیەکی ناوبازاڕ:

(( محە ناشوکر، پیاوێکی تەمەن نزیکەی ٧٠ ساڵ، سەروڕیش هاتووی سپی، چەند مقەبایەک کۆ ئەکاتەوەو ڕایئەخات و هەندێکی وەک دیوار بۆ ژێر قادرمەکە دائەنێ.. بەرگ و سیپاڵی شڕ))

محە(( لەبەرخۆیەوە)): دەی ئاخر شوکرانە بژێری چی بم؟ ئەوە کوڕو کاڵ ئەڵێن ئەمشەو لە سەعات دووەوە بارانەکە دەست پێئەکاو چەند ڕۆژێک خۆش ناکاتەوە.. دەی وەرە ڕەق هەڵنەیەیت... دەبییی بزانین چیمان پێ ئەکا!

(( هەندێ مقەباش وا دائەنێ کە ئەچێتە ژوورەوە بۆ خەو، وەک دەرگا بەکاریان ئەهێنێ، بە جۆرێک نەفەس بڕی بکا))

Cut

دیمەنی – ٧ – ش/ ن –ماڵی ڕێشار:

(( ماڵێک پڕ لە کەلوپەلی بە نرخ، بێزەوقیی لە دانانی کەلوپەلدا.. دیزاینی ناشرین، بە ڕەنگی جۆراوجۆری نا منسق.. ڕێشار، قسە ڕەق و ووشک.. کرمانج بە پێوە وەستاوە، ملکەچە))

کرمانج: گەورەم من سەد کارتۆنی خاڵییم بۆ بردو پێشم وت هەموو مریشکە ئێکسپایەرەکان بخەرە ناویانەوەو با لە کارتۆنی خۆیاندا نەبن.. بڵێم چی ئەو هەرچی چامان هەیە هەڵیرژاندۆتە ئەو کارتۆنانەوە؟! وەڵا وە بیلا دوو سێ جاریشم پێوتەوە.

ڕێشار: ئەگەر یەکەمجارت بووایە باوەڕم پێ ئەکردی گێژو وێژ.. تۆ دوو سێ مانگە لای منی، هەر خەفەتی بۆ من.. جاری پێشووش سابوونە ڕەقیەکانت شاردەوە لە بری تایتە فەلەکە.. بەس کێشەکە ئەوە نییە تێ ناگەی، کێشەکە ئەوەیە کرمانج، تۆ چوار پێی! ڕەشەوڵاخێک لە تۆ زووتر تێ ئەگا. خەتای منە پشتم پێ بەستووی!

کرمانج: ئێستا پێم بڵێ چی بکەم گەورەم ، چۆن ئەو هەڵەیە ڕاستکەمەوە؟!

ڕێشار: من نازانم؟! تۆ ئەزانی زیانی چەندت لێداوم؟ هەم چاکان و هەم مریشکە ئێکسپایەرەکانیش، کە ڕۆژی بەرهەمهێنانی تا ئێستا نەگۆڕاوە.. خۆی ئەبووایە ئەمڕۆ ساغ بکرایەتەوە، نازانی مریشک چەند دابەزیوە؟ بەیانیش ئەوەندەیتر هاڕە ئەکات و قوڕ ئەکرێ بەسەر منا.

کرمانج: گەورەم تازە ئەبێ چاکان بە نرخی فەل بفرۆشین..

ڕێشار: بەڵێ خۆشیی لە خۆت!

کرمانج: مریشکەکەش هەرچەند کورتی هێنا، هەر لەسەر خۆم.

ڕێشار: هەی گەمژە! ئەی خۆ لەسەر منیش نابێ؟ ئەوە هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە. بەزاتی خوا پاشا بزانێ لەتوپەتمان ئەکا لەسەری.. خۆ پارەی هەوانتەی بۆ هەڵنەڕشتووین.

کرمانج: باشە گەورەم.. هەرچەندە زۆریشە، بەڵام خۆم ئەیبژێرم.. چارم نییە چی بکەم؟

ڕێشار: چاوت دەرئەهات.. جارێ با بزانین چەند کورت ئەهێنێ، ئەوسا بڕۆ چارەسەری بکە، هیچ بە من مەڵێ.

(( ڕەحمانی خزمەتکار دێتە ژوورەوە))

ڕەحمان: گەورەم ژنێک هاتووە ئەڵێ ئەمەوێ بیبینم.

ڕێشار(( بۆ کرمانج)): وەک پێم وتی، بڕۆ چارەسەری بکە.. ئێستا بڕۆ، خێرا..

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم.

ڕێشار (( بۆ خزمەتکار)): با بێت!

(( ڕەحمان و کرمانج ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٨ – ش/ د – بەردەمی گەراجێکی سەیارە:

Mute

(( سەیارەیەکی بەرزی مۆدێل کۆن لە نزیکی گەراجەکە ئەوەستێت.. دارەوان کەمامەیەکی بە دەموپلەوەیە، دائەبەزێت و هەندێک چاو ئەگێڕێت و ئامارەی سەیارەکە ئەکا بڕوا، دواتر ئەچێتە گەراجەکەوەو سەیارەی خۆی دەرئەکات و ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٩ – ڕ/ د – ناو گوزەرێک:

(( خدر عەرەبانەکەی پاڵ ئەنێت کە باری لەسەرەو لەفەیەک بە دەستیەوەیەتی ئەیخوات.. هەندرێنی تەمەن ٣٥- ٤٠ ساڵ ئەبینێت، هەژاریی پێوە دیارە، کراس و پانتۆڵ و قەمسەڵە یان پاڵتۆیەکی کەمێک کۆن، سمێڵی هەیە.. ئەگاتە ئاستی خدر ڕایئەگرێ))

هەندرێن: خوا قوەتت با حەمە خدر گیان.. باشیت؟

خدر: ئۆو هەندرێن باشیت براکەم؟ من باشم، بەس هیلاکم.

هەندرێن: لەشت ساغ بێ یاخوا.. ئەڵێم لە پەنایەکەوە ئیشێکم بۆ پەیا ناکەی کاکە گوڵەکەم؟

خدر: جا تۆ حەماڵیت پێ ئەکرێ، باوەڕ ناکەم بێزت بێ بیکەی!

هەندرێن: دە یەکجار واش نا کاکە، من بڕوانامەی شەشی ئەدەبیم هەیە، ئاخر چۆن حەماڵیی بکەم.

خدر: کورە بڕوانامە مۆدێلی بەسەرچووە هەندرێن گیان، ئەبێ خۆزگە بە من بخوازی کە نیمەو هەموو ئیشێ ئەکەم و هەر گوێشی نادەمێ.

هەندرێن: نا نا حمە خدر گیان، بۆ ئیشێکی باش گوێم بۆ هەڵخە، من ئەزانم تۆ زۆر لەناو ئەو بازرگان و دەوڵەمەندانەیای، متمانەشت پێ ئەکەن بۆ هەموو شتێ.

خدر: لە دوورەوە وا دیارە ڕاست ئەکەی.. بەڵام لە نزیکەوە، هەر سوکایەتیی پێکردن و بە کۆیلە زانینە کاکە، وای تێمەگە.. بڕوا بکە زۆر دان بە جەرگی خۆما نەنێم، ناتوانم نیو سەعات چییە، ئەم ئیشە بکەم.

هەندرێن: دە تۆش مەکەوەرە سکاڵا دەربڕین، وەزعی هەموومان وایە.. خۆ هەژاریی هەر بێ نان و ئاویی نییە گیانەکەم، وردەکارییەکەی کوشندەترە.

خدر: دەی کەواتە ناتوانم هیچت بۆ بکەم، خۆت باش تێئەگەی.

هەندرێن: ئێهـ وتم ئەمە خوایە لە بەردەمی تۆیا باسی ئیشێک بکرێ و تۆش ناوی من ببەی، خۆ هەموویان ئەمناسن بەساقە، بەس ئەوەیە جاروبار منیان بیر ئەکەوێتەوە.

خدر: جا بۆ ناڵێی من تۆیان بیربخەمەوە؟ بەزاتی خوا کەماڵیان بە لالغاوەما، ئەبێ مانگێک لە دەست چاڵ و چۆڵیی ڕیش نەتاشم.. ئەوە تۆ ئەڵێی چی هەندرێن گیان.. بچۆرە بەرچاویان و زوو زوو خۆت نیشان بدەی لە هەمووی باشترە.. ببورە توخوا ئەبێ بڕۆم باری ڕێشارم پێیە، با دوا نەکەوم، حەزم لێ نییە شەقشەقێنم پێبکا!

هەندرێن: ئەی ئیتر کە پیاو بێ پارە بێ وەک من کلۆڵ ئەبێ، بڕوا بکە مناڵەکانیشی پێی ئەڵێن قسە مەکە، باوک بوویتایە هەموو ڕۆژێخەرجانەکەت ئەدامێ.!!!

خدر(( ئەجوڵێ)): پێیان بڵێ بە کەس نەوێرم بە ئێوە ئەوێرم هههههه.

هەندرێن: ئاخر ئەوە ئەقڵە دواکەوتووەکەتە خدر، چۆن دەستم ئەچێتە مناڵ؟

(( خدرو هەندرێن هەریەکەو بە لایەکا ئەڕۆن))

______________ Cut ______________

دیمەنی – ١٠ – ڕ/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار بە تراکسودێکەوە لە خەو هەڵئەسێ، سەرەو کرمانج چاوەڕێی ئەکەن، ڕەحمانی خزمەتکاریش بە پەلە ڕائەکات و خاولییەک ئەخاتە سەرمەچەکی و دێتەوە، هەموو لەبەری هەڵئەسن بە گەورەم بانگی ئەکەن و بەیانی باشی لێئەکەن و ئەویش لە ژێر لێوەوە وەڵامیان ئەداتەوە ))

ڕێشار: کێ لە کۆمپانیایە؟

سەرە: گەورەم مالەی لێیە، تەنها مریەم خان هاتۆتە خزمەتت، دواتر سەر ئەداتەوە.

ڕێشار: کەواتە با زوو بڕۆین.. (( بەرەو تەوالێت و حەمام ئەچێت ))

کرمانج: مریەم خان کێیە سەرە؟

سەرە: جارێکیتر نەپرسی و سەری خۆتی لەسەر دامەنێ.. کەسمان نازانیین کێیەو چ کارەیە.. تەنها گەورەم ئەزانێ.

کرمانج: ئەهلی بازرگانییە؟

سەرە: وتم پرسیار مەکە.. منیش نازانم.

(( ڕەحمان لەبەردەمی حمام و توالێتا وەستاوە ))

Cut

دیمەنی – ١١ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر/ژووری دارەوان:

(( دارەوان و مریەم دانیشتوون))

مریەم: نازانم کەوتۆتە کوێوە؟ حەفتەی پێشوو بوو، نامەیەکی لە ژێر دەرگاکەوە بۆ فڕێدابووم.. ئەڵێ ژیانم لەم شارەدا نەماوە، وا زوو ناتبینمەوە.

دارەوان: مریەم من دیدەوانم خۆش ئەوێ، گوناحە! خوا ئەزانێ کێ تەنگی پێهەڵچنییوە؟

مریەم: خۆی دەرئەکەوێتەوە، من دەمێکە ئەیناسم بڵێم بەقەدەر تۆ، درۆی تیا نییە.. بەڵام گوناح نییە هههە.

دارەوان: کەواتە تۆ هەوڵ بدە نەیبینیت و خۆت لە کێشەیەوە نەئاڵێنی.

مریەم: من ئیش ئەکەم دارەوان، هەر کەسێ لە بازاڕەکەیا بوو ئەوە هاوڕێ و نزیکمە.. کە لیم قەوما کەس بە هانامەوە نایەت، تا لە خەمی ئەم و ئەوا بم.

دارەوان: ئاخر بۆیە بەدڵمیت.. ناهێڵی کەس بە شوێنت بزانێ و کەسیش بەوە بزانێ کە بازرگانییەکی سەرکەوتوو ئەکەیت.

مریەم: من نەمهێشتووە کەس ناویشم بزانێ، نەک نهێنیم.. ئەوە ئێستا لای ڕێشار بووم، هەرچەند ئەزانم حەز بە ناوهێنانیشی ناکەی.

دارەوان: بە هیچ جۆرێک.

مریەم: خۆی لەوێ نەبوو، جوابم بۆ دانا کە ئەگەڕێمەوە.. بەڵام ئەوە مریەم نییە بە دەستی خۆی داو بۆ خۆی دابنێ، نابێ کەس بزانێ چۆن پەیا ئەبم و چۆن ون ئەبم.

دارەوان: دەستت خۆش بێ، ئاقڵیە مریەم گیان، هەرچەندە وا زانیمان ناوت مریەمیش نییە هههە، بەڵام تەنها ئەوەندە بزانم، لەم شارەیا ئەژیت؟ یان شوێنیتر؟

مریەم(( هەڵئەسێ)): هاهاها بۆ ئەوە کەمە دارەوان؟ من خۆشم نازانم لە کوێ ئەژیم، چی بە تۆ بڵێم.. ئەوەندەی پێویستە تۆ بیزانیت، بەوجۆرە پەیوەندیم پێوە بکە کە بۆم باسکردی.. هیچیتر نابێ بزانیت.

دارەوان: بەڕاستی پێت سەرسامم کە ئەوەندە قسە لە ڕوویت!

مریەم: ئەگەر وانەبم، ئەبم بەژێر داروپەردووەوە هههە.. بای ئەتبینمەوە.

دارەوان(( لەبەری هەڵئەسێ)): ئاگاداری خۆت بە.

مریەم: وا ئەکەم.

(( مریەم ئەچێتە دەرەوەو دارەوان لە ژوورەکەدایە))

Cut

دیمەنی – ١٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر/ژووری زوبێر:

(( زوبێر تەماشای سەعاتی سەر دیوارەکە ئەکا، تێل ئەکا.. ))

زوبێر: کچم دڵت شتێ نەکا، ئەمشەو درەنگ دێمەوە.

چیمەن(( دەنگ )): کەواتە بۆ ئێوارە چێشت لێ نەنێم؟

(( دارەوان دێتە ژوورەوە ))

زوبێر: نا کچم خۆم خواردن ئەهێنمەوە، هیچ ئامادە مەکە، کە هاتمەوە پێکەوە نانەکە ئەخۆین.

چیمەن: باشە باوە گیان، چاوەڕێت ئەکەم، زوو بێیتەوە. (( دارەوان دیقەت ئەدا ))

زوبێر: بە سەرچاو گوڵەکەم.

دارەوان: ئای خوایە چەندت خۆش ئەوێ، وەک من و تیرۆژی کچم وان ئێوەش.

زوبێر: خۆشویستنی مناڵ لە هیچ خۆشەویستییەکیتر ناچێ دارەوان، ئەو بە هەموو هەبوونی خۆیەوە، تۆ ئەکا بە نمونە باڵاکەی و بەرائەتت بەسەرا ئەڕێژێ.. خۆ ئەگەر واشنەبێ.. تۆ ئایندەیەکت خوڵقاندووە، کە ژیانت پێ بەخشییوە.. من بەردەوام بیر لەوە ئەکەمەوە، بۆچی هێنامنە ژیانەوە، کە دواتر ئەبێ بمرن؟

دارەوان: یەکجار وا تۆخی مەکەرەوە زوبێر گیان، ژیان هەروا هاتووە.. بەلام من هەست ئەکەم ئەمەیانت بەهۆی ئەو وەزعەیەوە زیاتر خۆش ئەوێ.. ئەگینا بۆ ئەوانیتر وانیت.

Cut

دیمەنی – ١٣ – ڕ/ د – بەردەمی دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( دوکانی مەوادی کارەبا فرۆشتنە، ئاوا لە دەرەوە بەدیار ئەشیاکانەوەو ئامۆ لە ژوورەوە.. محە ناشوکر لە پەنا دیوارێکا دانیشتووە.. کەسێک یەک دوو پارچە ئەشیا لە ئاوا داوا ئەکات و ئەویش پێی ئەڵێ بچێتە ژوورەوە))

ئاوا(( بۆ محە)): نانت خواردووە مامە محە؟

محە: ئەگەر چاوەڕێی تۆم بکردایە ئەبووایە سک هەڵگوشم.

ئاوا: دە گلەیی مەکە، خۆت ئەزانی سەرمان چەند قەرەباڵغ بوو، خۆشم نانم نەخواردووە.

محە: تۆ گەنجی ئاوا گیان بە چڵمی خۆت ئەژیت، من بەرگەی یەک تۆسقاڵ برسێتیی ناگرم، هەموو ناوسکم ئەداتە ئازار.

ئاوا: ئەزانم ئەزانم.. لە بری ئەوەی ئاوا هەڵکورمێی لە بن ئەو دیوارەیا، بهاتیایەو پێیت بوتمایە.

محە: ئەو قسەیە بۆ کەسێ بکە خوی بەو جۆرە سازشەوە گرتبێ.. ئەوە من نیم کوڕەکەی دارەوان!

ئاوا: ئەوە لە نێوانی من و تۆیا نییە مامە محە.. من وەک وڕی خۆت تەماشاکە.

محە: ئەوە لە نێوانی خۆم و خۆشما هەیە ئاوا گیان، چۆن بتوانم بۆ پاروە نانێ سوپاس و ستایش بکەم؟ لێیگەڕێ و با زیاتر نەڵێم.

ئاوا: بەخوا تەواوە مامە محە ناوەکەت بەخەسار نەداوە، محە ناشوکر، نازناوێکە هەر لە خۆت دێت.. هههە.

محە: ئەی خۆ گاڵتە نییە هههە.

Cut

دیمەنی – ١٤ – ڕ - عەسر / د – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

(( هەڵشۆ گەنجێکی تەمەن نزیکەی ٣٥ ساڵان لە دەرگا ئەدات، جلوبەرگی ئاسایی.. نارەوەن دەرگا ئەکاتەوە))

نارەوەن: ئەوە تۆ بۆ ناچی بۆ لای دارەوان لەگەڵ ئەوا بیبرێنیتەوە؟ هەر ئەوەنە ئەزانم دێیت و فلق سەرودڵی من ئەگری.. ئێستا چیت بۆ بکەم؟ (( بەگاڵتەپێکردنەوە)) بۆ نەیەم قاوەخانەکەشت بۆ بگێڕم ها؟ ئاخر زاوایەکی زۆر لەباری!

هەڵشۆ: دە تۆ بهێڵە منیش قسەیەک بکەم، بۆ ئەوە نەهاتووم نارەوەن خان.

نارەوەن(( تووڕە)): ئەی بۆچی هاتووی هەڵشۆ؟ ها! پارەی کچەکەت هەموو ماشیەوەو لرفت لێدا، ئیتر چیت ئەوێ؟

هەڵشۆ(( سەربائەدا)): ئای خوایە گیان!! من هاتووم پێت بڵێم تریفە کەمێک نەساغە، ئەمڕۆ کەس نییە لە قاوەخانەکە بێ.

نارەوەن: ئەی خۆت زەلامێکی زل و مل ئەستوور، بۆ لەوێ دانانیشی.. وەڵا ئاڵتون وتی، نارەوەن خان من هەر ئەتوانم هەفتەی جارێک بێم و ماڵ بۆ تۆ پاک بکەمەوە، قاوەخانەو شتی وا بە من مەکە، جارێکیتر ناتوانم بچم، ئینجا خەمت نەبێ، یەکسەریش تێت گەیشت، وتی زۆر چروک و خۆبەشت زانە، من تاقەتی ئەوم نییە.

هەڵشۆ: کەیفی خۆیەتی.. ئێستا چی بکەم.

نارەوەن: تریفە چییەتی دایکی بمرێ، بەدەست تۆوە زوخاوەسک بووە هەش بەسەرە.

هەڵشۆ: هیچ هیچی نییە وازی لێ بێنە، خواحافیز.

نارەوەن: نەمویست بزانم چییەتی، ئێستا خۆم تەلەفونی بۆ ئەکەم.

(( نارەوەن دەرگا دائەخات و ئەچێتەوە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥ – ڕ – ئێوارەیەکی درەنگ / د – بەردەمی کۆمپانیای ڕێشار:

(( ئەردەڵان تەنها دانیشتووەو هەندێک هەزاریی و پێنج سەدی دەرئەهێنێ ئەیژمێرێ))

ئەردەڵان: ئێهـ ئەوە گەیشتمەوە بە ڕۆژانەی خۆم.. ماڵی ئەو حەمەخدرە خوێڕییەش ئاوا بێ هەندێ ئیشی خۆی دامێ، ئەگینا بە خوا ئەمە پەیا نەئەبوو.. (( پێکەنین)) ئەڵێ مەهێڵە بزانن ئیشەکەم داوە بە تۆ هههههه، ئای خوایە لەم سەگی سەگبابانە، کەسی نایەوێ ئیشێ بدا بە من، دیارە بە پیس و پۆخڵم ئەزانن هەهە وەک حمە خدر قاتی ئوتوکراوی لەبەرابێ.

با کەمێکیتریش بمێنمەوە، خۆ حمەخدری لێ نییە، بەڵکو شتێ پەیا بێ.. دەی خوایە.

Cut

دیمەنی – ١٦ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( لە هۆڵەکەدا چیمەن تەنهایە، هەناسەی سوارە.. ئەگری و قژی ئاڵۆسکاوە))

**چیمەن مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

دەی ئێستا ئەبێ لە کوێ بێ؟ ئەی خوا هاوار من ئێستە چی بە باوکم بڵێم؟ ئەوە دوو ڕۆژە لێم ئەپرسێ بۆ تەنگە نەفەسم؟ ئاخر من چی بڵێم؟ بڵێم لەگەڵ کوڕێک پەیوەندیم هەیەو دوو ڕۆژە خۆی لێ شاردوومەتەوەو مۆبایلیشی داخستووە؟ دەی ئەبێ چەند بە گەوجم بزانێ؟!.. (( ڕووئەکاتە وێنەکە)) توخوا باوکە گیان بمبوورە.. بەرگەی ئەو نیگا گەرمانەت ناگرم، کە پڕ پڕە لە لێپرسینەوەو سۆزو خۆشویستنت بۆ من.. (( ئەگری و بە ژوورەکەدا دێت و ئەچێ و بۆکس لەناو مستی خۆی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ١٧ – ش/ن – کۆمپانیای زوبێر:

((زوبێرو ڕۆستەم و سالم دوو کەسی تێکسمڕاوی چوارشانەو بالآبەرزو عەشایەرن، لەگەڵ ڕێژوان گەنجێکی کەشخەی تەمەن دەوروبەری ٣٠ ساڵ.. دانیشتوون.. ڕۆستەم و سالم لە سازشدان))

زوبێر: ڕیژوان گیان لەبەردەمی هیچ کەسێکدا ناوی ئەم ڕۆستەم و سالمە مەهێنە کورم..

ڕێژوان: کوا باوکە؟

زوبێر: با ئێستا حەمەخدر لێرە بوو، نەئەبووایە ناویان بهێنی.

ڕۆستەم: حەمەخدر قەینا مامۆستا زوبێر، ئەو ڕێک وەک برام وایە، متمانەی دنیام پێیەتی.. هیچ شتێکی شاراوەمان نییە لەیەکتر، هەر حەلآڵمان جیایە، زۆر تێکەڵین.

زوبێر: من حەز ئەکەم ئێوە دوور بە دوور ئاگاتان لەو بارانە بێت و هەرچییەکی ناموتان بینی دواتر بە خۆم بڵێن، نامەوێ کەس، هیچ کەسێک، تەنانەت دارەوانیش کە شەریکمە، بزانێ هیچ جۆرە پەیوەندییەکمان هەیە.

سالم: مامۆستا زوبێر گیان هیچ خەمت نەبێت، ئەوەی لە باری پێشوودا کردمان و نەمانهێشت کابرا دزییەکەی بکا، بەڵگەی دڵسۆزیمانەو کەسیش پێی نەزانین کە لای جەنابت کار ئەکەین.

ڕۆستەم: جا ئەوە چییە؟ گەر مەبەستت بێ، هەرکەسێکیشت پێ خۆش بێ بۆت ئەکوژین، بێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ، سەرمان پێ بسپێرە مامۆستا.

زوبێر: نا بابە گیان پیاو کوشتنی چی؟ خوا بەدوورمانخاو قەت ڕێمان نەکەوێتە سەر ئەوەو ناچار نەبین.

ڕێژوان: باوە گیان ببورە، خۆ لە ڕاستیشدا هیچم نەوت، هەر ئەوەندەی وتم هاتوون و زانیشم کاک دارەوان لێرە نییە.

زوبێر: زۆر باشە ئێستا ئەتوانن برۆن، ڕەنگە لەم ڕۆژانەدا بارێکمان هەبێت و پێویستیی بە پاراستنیشی هەبێت، ئەمەم مەبەستە.. هەروەک جاران ڕێژوان لە شوێنی هاتن و کاتەکەی ئاگادارتان ئەکاتەوە.

سالم: ئەی مامۆستا ناکرێ ژمارەکەتمان لابێ.

زوبێر: نا من بۆ سەلامەتیی مانەوەی ئێوە نامەوێ هیچ جۆرە پەیوەندییەکم پێوە بکەن، ڕێژوان هەیەو هەرچییەکم ویست یان ئێوە پێویستتان بوو، لە ڕێگەی ئەوەوە ئەبێت.

ڕۆستەم: ئەی هاتوچۆی ئێرەمان نائاساییە؟

ڕۆستەم: گەر هاتن بۆ لای ڕێژوان دێن و هاوڕێی ئەون، یەک زەڕڕە من ناناسن.. ئەمە دوا دانیشتنمانە.

ڕۆستەم: بەڵێ ئەمرەفەرمووی.

ڕێژوان: دەی فەرموون با بچینە ژوورەکەی من، مانگانەو پاداشتی ئیشەکەشتان بدەمێ.

(( ڕێژوان و سالم و ڕۆستەم ئەچنە دەرەوەو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١٨ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( ماڵێکی هەژار.. تاقمێک قەنەفەی کۆن هەیەو هیچی ئەوتۆ لە ماڵەکەدا نابینرێ.. کومبارێکی دڕاو ڕاخراوە... هەندرێنی تەمەن ٣٥ ساڵ و تافانی جوانی هاوسەری، هەر لەو تەمەنانەدا لەسەر قەنەفەکە جاروبار تەماشای تیڤیەکی گەورەکان ئەکەن.. ))

هەندرێن: یەعنی هیچ شک نابەی؟!

تافان: نابەخوا هەندرێن گیان، وابزانم ٢٥ هەزارم پێماوە، ئێ خۆ تا تۆش شتێکت دێتە دەست، ئەبێ خەرجانەی مناڵەکان و بایی سەوزەیەکم پێ بێ.

هەندرێن: ئەی بۆ ١٠ ی نادەی بە من تافان گیان.. بزانم سبەی دەستی یەکێ نابڕم و قەرزێکی لێ بکەم؟! بەخوا بۆت ئەهێنمەوە.

تافان: نەبەخوا پیاوەکە، شتی وا ناکەم، بڕۆ قەرزی بکە باشترە، مناڵەکان نییە نازانن.

هەندرێن: حاجی مارف پێی وتووم دوو سبەی هەندێ شتی هەیە بۆی ببەم بۆی گومرگ بکەم.. خۆ ئەزانم شتێکی تیا ئەبێ بۆ من.

تافان: دەی وابڵێ بەساقە! باشە دەیت ئەدەمێ تا ئەوە وەرئەگری.

هەندرێن: کچێ کڵپەش داوای ئەتڵەسی جوگرافیای لێکردووم، خوا ئەزانێ ئەوەش بە چەندە؟

تافان: تەواو هەندرێن گیان، مرخی زیاتر خۆش مەکە، بەخوا یەک دیناریترم لێ هەڵناوەرێ.. تەواو هەر ئەو دەیەت ئەدەمێ.

(( جەڕەسی مۆبایل بۆ هەندرێن دێت))

هەندرێن: ئەلو سەلوا گیان، بەڵێ!

سەلوا (( بەگریانەوە)): کاکە فریاکەوە باوکم زۆر هیلاکە بیگەیەنە نەخۆشخانەیەک.

هەندرێن (( شپرزە)): چۆۆۆن؟؟؟ بۆ چییەتی؟ دیسان خۆی ماندوو کردووە؟

سەلوا: نابەخوا هەر لە ماڵەوەش بوو، ڕەنگە هەر جەڵتە بێ، توخوا زوو وەرە کاکە.

هەندرێن: باشە کاکە گیان تۆ تەکسیەکی بۆ بگرە و بیهێننە فریاکەوتن، وا منیش دێم بۆ ئەوێ.

سەلوا: ئاخر پارەی تەکسیم پێ نییە کاکە گیان.

هەندرێن: باشە سەلوا گیان تۆ بیهێنە من لەوێ کرێکە ئەدەم. دەی خواحافیزت.

(( مۆبایلەکە دائەخاتەوە)) بە پەلە بچم فریاکەوم.. سەیری ئەو نەگبەتییە.. ئا بێنە ئەو دەیەم بەرێ.

تافان: وەیش توخوا مامە ڕەحیم گیان.. بوەستە منیش دێم.. ٢٠ ت ئەدەمێ با پێت بێ دنیا هەزار شتە. با بە مناڵەکان بڵێم دەرگا باش داخەن و خۆشم بگۆڕم.. (( بەرەو دەرگا ئەچێت و بانگی مناڵ ئەکا)) کڵپە کڵپە.. باڵا ئەوە لە کوێن؟

(( هەندرێنیش خۆی ئەگۆڕێت))

Cut

دیمەنی – ١٩ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار خواردنەوەی لە بەردەمدایەو کرمانج کەمێک قۆڵی چاکەتەکەی هەڵئەکات و پێکێکی قەیتانیی بۆ تێ ئەکا.. ڕەحمان مەزەی تازەی بۆ ئەهێنێ.. مالە دانیشتووەو سەرەش لە دوورتر یاری بە مۆبایل ئەکا، تەلەفزیۆن بە بێدەنگیی هەڵکراوە ))

ڕێشار: من نازانم ئەو دووە چۆن یەکیان گرتووە.. ئەویان کابرایەکە بە ژەهری مارەوە ئەخورێ و ئەمەشیان بەدفەسساڵ و سەگ و سەگباب.

مالە: جا گەورەم گەر حەز ئەکەی لەبەرچاوت ون بێ، چارەسەری ئاسانە، فیشەکیش زۆر گران نییە.

ڕێشار: کەرەکەر مەکە، بە پێچەوانەوە ئەرکی ئێوە پاراستنیەتی، ئەگەر زانیتان کەسێکی نەناسراویش ئەیەوێ زیانێکی پێ بگەیەنێ، ئێوە ئەبێ بە هەموو تواناتانەوە ڕێی لێبگرن و نەهێڵن کەس بچێ بە پەرێزیا.

کرمانج: ئەمەیان بۆ گەورەم؟ هەڵبەت حیکمەتێکی تیایە!

ڕێشار: ئێوە ئەزانن کە هەرچی خەڵکی ئەم گوزەرەو دەرەوەشە، ئەزانن کە خۆشیم بە چارەی ئەم دارەوانە نەگریسەیا نایەت.. هەر شتێکی بەسەر بێ خەڵک هەموو پەنجەی تۆمەتبار کردن بۆ من درێژ ئەکەن.. بە ناچاریی ئەبێ بشیپارێزم هههە.

مالە: تازەترین جۆری ناحەزییە ئەم ڕقەی تۆ.

ڕێشار: خۆ ئەبووایە هەر دوێنێ کە بەو چاوەوە تەماشای کردم، شەقشەقێنی ئەو جادەو کۆڵان بانەی پێ بکەم، بەڵام من شەقی تێهەڵنادەم.. لەو بارەیا کە ئەیهێنن تۆڵەی بەرودوای لێ ئەکەمەوە.

سەرە(( ئاوڕیان بۆ ئەداتەوە)): بارەکەیان چەور دیارە.

ڕێشار: چەند چەور بێ، بە بێ من بە قوڕگیانا ناچێتە خوارەوە.. ئەوە جارێ زوبێر دەستەودامانم بووە، ئەڵێ بۆمان بپارێزە.

کرمانج: خۆ من ئەزانم هیچ کەسێک ناتوانێ شتێکی تازە بهێنێتە بازاڕەوە، سەرانەی خۆی نەدا بە کاکە ڕێشار.. ئەوە یاسای بازرگانەکانە، خۆیان باش ئەیزانن.. ئەو ملکەچییە زوبێرو دارەوانیش ئەگرێتەوە؟

سەرە: ئەگەر وا نەکا بە مایەو قازانجەوە، تیا ئەچێ.

ڕێشار: ئەوە بۆ هەموو کەسێکە.. بەیانی خۆم ئەچم بۆ لای زوبێرو دارێکی وا ئەدەم بە ڕوحیانا بۆ کوڕاوکوڕیان بەسیان بێ.

مالە: سەرانەکەی زیاد ئەکەی؟

ڕێشار: با دارەوانە کەرە بە چاوی ڕقەوە تەماشامکا کێشە نییە.. بەیانی خۆی ئەزانێ باجی ئەو تەماشا کردنەی چەندە؟ ئەگینا بە بیللاهی ئەیانخەمە سەر ساجی عەلی.. چونکە زانیومە هەموو ساماناکەیان خستۆتە ئەم بارە گەورەیەوە.

Cut

دیمەنی – ٢٠ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( خدر دێتەوە ژوورەوەو لەفەیەک بۆ خۆی دروست ئەکا، لە هەموو شتێکدا پەلە ئەکاو گورج و گۆڵە.. هاوڕێی چایچیی و ئەردەڵانی حەماڵیش لەوێن))

حەمە خدر: ئا هاوڕێ خێرا، خێرا، چایەکم بەرێ.

هاوڕێ چایچی (( بەدەم چاتێکردنەوە)): ئەڵێی شوکور وەزع لە باشیایە حەمە خدر؟!

خدر: خراپ نییە، ١٠٠ کارتۆن چای فەلی کاک کرمانجە بیگوێزمەوە بۆ حاجی حەمەوەیسی عەلاف. (( ئەردەڵان خەفەت ئەخوا، پیش ئەخواتەوە))

هاوڕێ: هیچ نییە وامزانی چەند لۆرییەکت بەسەرا کەوتووە.

خدر (( بەدەم لەفە خواردنەوە)): خوا نەیبڕێ خراپ نییە هاوڕێ، قەت ناشوکور مەبە!

هاوڕێ: ئاخر حاڵت جوانە نەکەی ناشوکور بیت!

خدر: ناوەڵا من ناشوکور نیم برا.. خۆ دزی ناکەین و ئەوەی پەیای ئەکەین بەسە.. خۆ ئەهلی ئەوێ نیین!

ئەردەڵان: ئینجا بۆ ناچی بۆ ئەوێش؟

هاوڕێ (( چایەکەی بۆ ئەهێنێ و بە چرپە)): جا حەددت چییە ئەچی بە پەرێزی ئەوێیا؟ هههە ئەو سەروچاوەی تۆو ئەوێیان نەوتووە.

خدر: وەڵا پارەت پێ بێ بۆ تۆش دەست ئەدا.. مەساجیشی لێیە هههە.

ئەردەڵان: ئاخر ئەگەر نەچووبی چوزانی ئەوەشیان هەیە؟

خدر: ڕۆڵە من هەموو شتێ ئەزانم، خۆ وەک تۆ هەر پان نابمەوەو بۆڵە بکەم.

(( دارەوان دێتە ناو چاخانەکەوەو هاوڕێ بەرەو پیری ئەچێ، خدر ئەیەوێ بەخێر هاتنی بکا، پارووی لە دەمایە، ئەردەڵان لەبەری هەڵئەسێ و بەخێرهاتن و ڕیایی))

هاوڕێ: فەرموو مامۆستا دارەوان، فەرموو وەرە سەر ئەم مێزە، فەرموو فەرموو!

دارەوان: نا هاوڕێ گیان ئەڕۆم (( بۆ خدر)) ئەوە لێرەی ناموبارەک؟!

خدر: هەر نانێک ئەخۆم و دێمە خزمەتت مامۆستا دارەوان.

ئەردەڵان: دە ئەو نان ئەخوا با من بێم مامۆستا دارەوان!

دارەوان (( تەماشایەکی ئەکات و بە ئاماژە تێی ئەگەیەنێ کە ئەو بێ کەڵکە.. بەدەم چوونە دەرەوەوە)): دەی پەلەکە حەمەخدر، شتم بۆ داناوی.

خدر: سەرچاو سەرچاو هەر ئێستا.

هاوڕێ (( دوای دارەوان)): ئەی هەتیو کارتۆنەکانی کاک کرمانج؟!

خدر: کورە خەمی منت نەبێ.. ئەو زۆر پەلەی نییە، هەرکاتێ بیکەم ئەیکەم، با شەو بێ چییە؟

هاوڕێ: دەی خوا نەیبڕێ کەواتە وەزع لە باشیایە، بەخوا بەخوا هەر دەرکەوتی زانیم دەموچاوت ڕوونە.

(( خدر کەشکی پەنجەی ئەکێشێ بە مێزەکەدا، وەک دوورخستنەوەی چاوپیسیی و هەڵئەسێ و ئەڕوا ))

ئەردەڵان: باشە کاکە؟ بەرۆکیشیان ئەگری، ئیهمالت ئەکەن!!!

هاوڕێ: ئیتر ناوچەوانەکەیە ئەردەڵان گیان.

ئەردەڵان: جا کەی وەزعی ئەو لە باشییا نەبووە، دایمە ئەو پرسیارەی لێ ئەکەی؟

Cut

دیمەنی – ٢١ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای زوبێر:

Mute

(( ڕێشار بەرەو کۆمپانیای زوبێر ئەچێت، سەرەو ماڵە لە دوور وەستاون و چاودێریی ئەکەن.. هەر کەسێک لەو ناوە ئەبێ، ڕێی بۆ چۆڵ ئەکات و خۆیانی لێ لائەدەن.. تا ئەچێتە ژوورەوە))

—————— Cut —————— تابع ——————

دیمەنی – ٢٢ – متبوع - ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو ڕێشار))

ڕێشار(( لوتبەرز)): جا ئەوە هەر کێشە نییە.. تۆ بیهێنەو بێخەم بە.. پێش وەختە بەشەکەی خۆمان بدەرێ، ئیتر مارکەکەی پارێزراو ئەبێ.. کەسیش ناتوانێ کێبڕکێت بکا.

زوبێر (( زۆر زۆر نەرم قسە ئەکا)): ئەی کاکە ڕێشار نیازی چەندت هەیە؟

# (( ئەڵقەی دوو))

ڕێشار: ٦٠% ی قازانج.

زوبێر(( خەندەیەک)): باوەڕ بکە زۆر زۆرە هیچی وام بۆ نامێنێتەوە!

ڕێشار: ئەی ئیش ئاوایە کاک زوبێر، حەز ئەکەی بە دڵی خۆت.. خۆت بڕۆ بیهێنە، بەس داوای پاراستنی لە من مەکە.. بەڵام کە شارەکەیان لێ پڕ کرد، یان ناحەزێکت سوتاندنی و زیانی پێ گەیاندی، هانا بۆ من نەهێنی ها؟! (( هەڵئەسێتە سەرپێ)) ئیتر من دوا قسەم بۆ کردی.

زوبێر (( هەڵئەسێت)): جەنابت فەرموو دانیشە کاکە ڕێشار، مەبەستم ڕەتکردنەوەی نەبوو.. تەنها قسەیەک بوو.

______ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut __________

دیمەنی – ٢٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر – ڕاڕەوی بەردەم ژووری زوبێر:

(( دارەوان نزیکی دەرگاکە وەستاوەو گوێ ئەگرێت، دەنگی ئەوانیش لە ژوورەکەی زوبێرەوە ئەبیسرێت))

ڕێشار: نا هەر لەسەر ڕۆشتنم.. کەی کرمانج بنێرم بۆ بەشەکەی خۆم؟

زوبێر: هەرکاتێ گەیاندمە مەخزەن، ئاگادارت ئەکەمەوەو ئیتر هەر وەکو ئیشەکانی پێشوو.. دڵنیابە.

(( دارەوان بە پەلە ئەچێتەوە ژوورەکەی خۆی))

Cut

دیمەنی – ٢٤ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٢٢ – ڕ/ ن – ژووری زوبێر:

(( زوبێرو ڕێشار بە پێوەن))

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی ڕێشار.. زوبێر دائەنیشێتەوەو پاش کەمێک دارەوان دێتە ژوورەوە))

دارەوان: ئاخر توخوا ئەقڵ ئەیبڕێ ٦٠% وەڵاهی وایانکردووە کەسابەتیش نەکەین، هەر بە زۆری زۆرداریی لە شەریکەبەش زیاتر ئەبەن.. وەڵڵاهی خوا بەرداری نییە.

زوبێر: خۆ خۆت گوێت لێ بوو.. ئیتر ناچارییە.. باوەڕ بکە ڕێک نەکەوتمایە نەیئەهێشت لە سنوریش بیهێنم بەمدیواو ئەبووین بەژێر خەسارەتێکی گەورەشەوە. تازە شتەکە کراوە.

دارەوان: با بزانین چۆن ئەبێ، کە خێر نەهێڵێتەوە هەر ئەمجارە ئەیهێنین و تەواو.

زوبێر: نا خراپ نییە، بەوەی باشە تێچوونی کەمە، خەڵکیش بەدوای هەموو شتێکا ئەگەڕێ تازەبێ لە بازاڕا.

دارەوان: حەماڵەکەش شتەکانی برد.

زوبێر: باش بوو بیرم کەوتەوە.. ئەو هەندرێنەم بۆ بدۆزەرەوە، ئەم شەڕە سەگە بەو نەبێ بە کەس ناکرێ.

دارەوان: ئەڵێن باوکی لە بوژاندنەوەیە، هەر نەمرێ باشە لەم کاتەیا،. ئاساییە خۆم یەکێکی بۆ دائەنێم.

زوبێر: باوکیشی مردبێ، هەر بیهێنە، خۆم خەڵک ئەنێرم هەموو شتێکی بۆ بکا.. (( ڕێژوان دێتە ژوورەوە)) باش بوو، لە کاتی خۆیا هاتی ڕێژوان.

دارەوان: خۆ خەڵکیتر هەیە.

زوبێر: کاکە ئەو لە هەموو کەسێ باشترە، شارەزاو بێ سەرێشەیە.

ڕێژوان: فەرموو باوە گیان ئەمرکە.

زوبێر: ئەم چەند ڕۆژە بە ئەرکێک ڕاتئەسپێرم، مەیەرەوە بۆ ئێرە..

ڕێژوان: لە خزمەتتام، بەسەرچاو.

(( لە میوتیدا حوار هەیەو دارەوان هەر لەوێ ئەبێت، گوێ ئەگرێت))

ـــــــ تابع ــــــــــــــــــــــ Cut ــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٢٥ – متبوع - ڕ/ د – بەردەم کۆمپانیای ڕێشار:

Mute

(( پیرەمیردێکی سواڵکەر لە کۆمپانیاکەی ڕێشار نزیک ئەبێتەوە، لەو کاتەدا سەرەو مالە ((ڕانک و چۆغە.. عصبي.. ڕۆشتنی پۆزاوی.)) لە بەردەمی کۆمپانیای زوبێرن و ڕێشار دێتە دەرەوە، خەڵکی ڕاگوزاریی لەو ناوەدا هەن، لە ناویاندا خدر بارێک بە کۆڵیەوەیە.. سەرە، پاڵێک بە سواڵکەرەکەوە ئەنێت و لەسەر ڕێی ڕێشار دووری ئەخاتەوە، سواڵکەر خۆی بۆ ناگیرێتەوەو ئەکەوێت.. خەڵکەکە هەندێکیان سەربائەدەن و خدر کۆڵەکەی دائەنێت و ئەچێت ڕاستی ئەکاتەوەو ئەیتەکێنێ))

Cut

دیمەنی – ٢٦ – ڕ/ ن – ڕاڕەوی بەردەم بوژاندنەوەی دڵ:

(( هەندرێن لەبەردەم ژووری دکتۆردا وەستاوە.. سەلوای خوشکی تەمەن ٢٣- ٢٥ ساڵ، لەچک بەسەر، جوانە، دێت بۆ لای))

هەندرێن: ئەوە بۆ جێتهێشتووە سەلوا؟

سەلوا: هاتم بە یەکێ بڵێم لێدانەکەی دڵی زیادو کەم ئەکا.

هەندرێن: منیش چاوەڕوانی دکتۆرم، تۆ بچۆرەوە لای خۆم بە یەکێکیان ئەڵێم.. هۆشی نەهاتۆتەوە؟

سەلوا: نەوەڵا هۆشی چی کاکە؟

هەندرێن: دە برۆ تۆ برۆ.

(( سەلوا بە ڕاکردن ئەگەرێتەوە بۆ بوژاندنەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٧ – ڕ / د – گوندێک:

(( دیدەوان، تەمەنی ٥٥- ٦٠ساڵێک، گرنگی بە ڕوخسارو جلوبەرگی ئەدات، سمێڵی پانی هەیە.. لەگەڵ مام تەیفور پیاوێکی پیری خەڵکی گونددا دانیشتووە لە دیوەخاندا، جلی کوردی بە ڕێکیی لەبەردایە))

دیدەوان: کێشەی پارەمان نابێ.. تۆ دووسەد سەرێک پەیاکەو شوانێکی ئازاشم بۆ بدۆزەرەوە سەرەوکارییان بکات.. پێ ناچێ وا زوو بگەڕێمەوە بۆ شار.

پیر: بەسەرچاو، هەموویت بۆ دابین ئەکەم.

دیدەوان: ئیتر یەک دوو کوڕێ گەنجیشم بنێریتە لا.. ئەمە بۆ خواردنێکە ئیش و کارێکە شتێک، با بەردەستییەکم بکەن.

پیر: وەی بەسەرچاو، هەر کوڕەکانی خۆم ئەنێرمە لات خزمەتت بکەن.

دیدەوان: دەی منیش باش ئاگام لێیان ئەبێ مام تەیفور، خەمی هیچت نەبێ.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ۲۸ – ڕ/ن- قاوەخانەی تریفە:

(( نارەوەن لەگەڵ تریفەی کچی.. کچێکی جوانی تەمەن دەوروبەری ۳۰ساڵ دانیشتوون.. جاروبار کەسێک فاتورە ئەهێنێت و ئەمان بەردەوامیی بە قسەکانیان ئەدەنەوە.. تریفە کاشێرە))

نارەوەن: جا بۆم تەواو نەکردی.. ئەو ئەیوست ئەو هەموو شرکەوپڕکەیەی خۆی بەسەر هومای داماودا ساغکاتەوە.

تریفە: ئێ قەیچێکا خۆ زۆر کۆن نەبوون و هەرزانیش بوون.

نارەوەن: نا کچم تۆ نازانی، دوایی لە شوێنان ئەیوت کۆنەی من لەبەر ئەکاتەوە.. چۆن ئەهێڵم هوما قسەی بێتە سەر؟ نەوەڵا نەمهێشت!

تریفە: نازانم دایە ئەگەر خۆی بە دڵی بووبێ چ پەیوەندیی بە تۆوە هەیە، ئەوەتا لای من گلەیی لە تۆ ئەکرد، ئەیوت ئەو هەموو شتە جوانەی لەدەستدام.

نارەوەن: ئەو منداڵە، نازانێ، قەینا با لەکیسی بچێ.. دوو ڕۆژیتر خۆی فام ئەکاتەوە.

تریفە: بەخوا دایە حەز ناکەم کەس گلەییت لێ بکا.. تۆ زانکۆت تەواو کردووە، کەچی جاروبار لە شتێکا هەڵئەدەیتێ، کە پەیوەندیی بە تۆوە نییەو دواتریش لای من گلەییت لێ ئەکەن.

نارەوەن: چاویان دەرئەهات، بەخوا من شتێکم بەدڵ نەبێ، ناهێڵم دوژمنەکەشم بیکا.. باسی زانکۆش ئەکەی زانکۆی چی؟ ئەوەتای تەواوم کردووە بووم بە ژنی ماڵەوە، بۆ باوکت هێشتوویەتی شوێنێک بچم بە دڵی خۆی نەبووبێ؟

تریفە: وایە هی ئەوەیە کردووتی بە ژنی ماڵەوەو خراپییەکەشی ئەوەیە تەنیای.. بەڵام خۆت ئەزانی دایە گیان، ئەو شتانەش بەزمی بەدوادا دێت.

نارەوەن (( هەڵئەسێ و گرژ)): ئەی ئەوە نییە نەسیحەتکەری وەک تۆم هەیە؟! ئیتر بەزمی چی؟

تریفە(( هەڵئەسێت و بە زۆر دایئەنیشینێتەوە)): توخوا دایە گیان ببوورە (( ماچی ئەکا )) قەت حەددی ئەوەم نییە ئامۆگاریی تۆ بکەم، چۆن ئەوە بە خۆم ڕەوا ئەبینم؟

نارەوەن: ئەی ئەوە نییە ڕێم پێ نیشان ئەدەی؟

تریفە: نا بەخوا مەبەستم ئەوە نەبوو.. بەڵێن بێ ئیتر قسە لە قسەتا نەکەم.

نارەوەن: هەموو جارێک هەروا ئەڵێیت و دەست پێ ئەکەیتەوە.

تریفە: تۆ پێم بڵێ، تیرۆژ چۆنە لەگەڵ زانکۆکەی؟

نارەوەن: ئەویش سبەی دوو سبەی تەواوی ئەکاو شوو ئەکاو ئیتر بیری ئەچێتەوە دایکی هەیە، هەر ئەبێ من بەدوواتانا ڕاکەم.

تریفە: دەی ئەوە ئیشەکەمە دایە گیان، بەخوا تا یانزەی شەو وەک سەگی پێ سوتاو هەڵئەسوڕێم، حەوانەوەم نییە.. چی بکەم هەر یەک ڕۆژ ئۆفم هەیە، ئەویش بە کێیا ڕابگەم؟ چوارشەممە ئۆفەکەمە دێم دڵنیابە.

(( دایکی هەر گرژە.. دوو کرێکاری قاوەخانەکە، جسمی ڕیازیی. دوو کارتۆن ئاوی جامەکان دێنن بە داپۆشراویی و لەسەر مێزەکەی تریفە دایئەنێن..))

تریفە (( بۆ خورشیدی و پانتۆڵ لەبەر، تەمەنی نزیکەی ٤٥ ساڵێک، خەندەو ڕووخۆش)): ئەوە ١٥ پیتزاکەیە کاکە خورشید.

(( بەهزاد دێت وەریئەگرێت و پارە ئەدات و سوپاسکردن))

Cut

دیمەنی – ٢٩ – ڕ/ن – ناو سەیارەی تایەر – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

(( تایەری تەمەن ٢٥ ساڵ، جلەکانی نارێکن، لە نزیک ماڵی دارەوانەوە ئەڕوات، تیرۆژ ئەبینێ لە زانکۆ ئەگەڕێتەوە، بە پێ.. خاوی ئەکاتەوە ))

تایەر: ئای خوایە!! ئەو هەموو جوانییە!!! خوا بکا کەسێکی باش بێ و خوا بە قسمەتی بکا.. بەخوا جوانە!! وای براڕۆ کە جوانە. (( لە تیرۆژ تێپەڕ ئەبێت و بە خێرایی لە کۆلانێکیترەوە ئەگەڕێتەوە سەر ڕێگەی تیرۆژ.. بەڵام تیرۆژ نیشان ئەدرێ ئەچێتە ماڵەوەو ون ئەبێت )) ئەرێ ئەوە چی لێهات؟ تۆ بڵێی فریشتە بووبێت؟!.... ئەی چی لێهات ئەی هاوار؟ ئاسمان هەڵی لوشیی، ئەرز قووتیدا چی؟ .... (( بەو کۆلانانەدا ئەگەڕێ )).

Cut

دیمەنی – ٣٠ – ڕ – ئێوارەی درەنگ/ د – بەر هەیوانی ماڵی مریەم:

((مریەم وەستاوەو سەمەدو کامیل بە پەلە دێن))

مریەم: بۆ وا دواکەوتن باوکە؟

سەمەد: سەیارەیەک خۆی پیاکێشاین، لێشی خۆش بووین، کەچی ئەو بەرۆکی بەرنەئەداین.

مریەم: گرنگ ئەوەیە خۆتان سەلامەتن.. ١٥ کیلۆم بۆ دانراوە، وەرنە ژوورەوە ڕێ و جێگەیتان پێ بڵێم.

کامیل: ئەمشەو ئەچین؟

مریەم: کامیل گیان ئەمشەو لەگەڵ سەمەدا ئەچن و شەوەکیی ئەیخەنە ژێر جلەکانەوەو بە پیکابەکەوە بیدەنە دەست کابرای کڕیار.

سەمەد: لێرەش کڕیاری باشمان دەستکەوتووە.

مریەم: نا نا نا سەمەد گیان، ڕازیم نییە یەک گرامی لێرە بفرۆشنەوە، ئەوە شێرپەنجەیە، بۆ خەڵکی خۆمان نابێ، کڕیارەکە لە دەرەوەیە.

سەمەد: باشە دادە مریەم گیان، هەرچییەک جەنابت ئەمری پێ بکەی.

مریەم: ئێوە وەرنە ژوورەوە جارێ. (( بەرەو ژوورەوە ئەچێ))

کامیل: فەرموو دادە مریەم.

Cut

دیمەنی – ٣١ – ڕ / د – بەردەمی مخزنی ڕێشار:

(( ئەحەو کارە، تەمەن نزیکەی ٢٥- ٢٨ساڵ، جلوبەرگی حەماڵ، عەرەبانەیان پێیەو وەستاون خدریش بە عەرەبانەکەیەوە دێت))

ئەحە: کاک حمە خدر گیان بچین بۆ کارتۆنە چاکان؟

خدر: ئا ئا ئەحە گیان دەستوبردێک بکەین باشە.. ئەمڕۆ هیچ هەواڵێک نییە؟

کارە: قوربان، سەرەو ماڵە یەک دوو شەوە ڕێشار جێ ئەهێڵن و خۆیان بە تەنها سواری سەیارەیەک ئەبن و بۆی دەرئەچن.. قەت وا نەبوون، بەردەوام یەکێکیان لەگەڵ ڕێشارا هەر ڕۆشتۆتەوە.

خدر: چەند ڕۆژە؟

ئەحە: وەڵا بەم ئێوارەیەوە دوو شەوە.

خدر: زۆر باشە دەستتان خۆش.. ئەوە نیشانەی وریاییتانە.. ها کارە ئەوە کلیلی مەخزەنەکە بیکەرەوە با خێرا ئەو کارتۆنانەش تەواوکەین.

(( کارە وەریئەگرێ و بە کردنەوەی دەرگاوە مشغوڵ ئەبێ))

Cut

دیمەنی – ٣٢ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن بە تەنها دانیشتووەو بیرئەکاتەوە، جاروبار هەناسەسوار))

چیمەن **<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>**:

ئەمشەو پێی ئەڵێم، هیچ چارەسەرێکم نەماوە، ئەگەر وا نەبێ، ڕەنگە خەفەقان بم و دڵیشم بوەستێ.. نا باوکم بە هۆی نەخۆشییەکەمەوە سەرزەنشتی زۆرم ناکا، تەنها ئامۆژگارییم ئەکا.. ئای خوایە، ئەبێ بروسک توشی چی هاتبێ؟ یان ڕەنگە خۆی بدزێتەوە.. نا باوەڕ ناکەم لەو جۆرە کوڕانە نییە.. نا نا، هەرگیز باوەڕ ناکەم، هەر ڕەنگە دایک و باوکی یان کەسێکی مردبێ، یان هەر توشی شتێک بووبێ.

**<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>**:

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٣٣ – ش/ د – بەردەمی بوژاندنەوەی دڵ:

(( هەندرێن تەلەفون ئەکا ))

هەندرێن: ئاخر گەورەم باوکم پەکیەتی، بەخوا زۆر لە مەترسیایە............ نەوەڵا قسەم لەگەڵ دکتۆرا کرد، وتی ئەو صمامەیەی بۆم داناوە، دوا چارەسەرەو ئەبێ ١٠ سەعات لە ژێر چاودێرییا بێ، تێی بپەڕێنێ ئیشەڵڵا باش ئەبێ، بەخوا ئەمە دووەم نەشتەرگەرییە بۆی ئەکەن، ئەوی پێشووی سەرکەوتوو نەبوو............ ٧ سەعات تێپەڕیوە گەورەم................ ئەوەندە بە پەلەیە؟ ................ باشە بەسەرچاو، کەواتە دەسەڵات نییە، ئەمشەو لای ئەمێنمەوەو بەیانی دێمە خزمەتت................ ئەی ماڵەکەت ئاوا بێ زۆر مەمنونی تۆم گەورەم.......... بەڵێ بەسەرچاو، خواحافیز، خواحافیز، خواحافیز گەورەم خوات لەگەڵ.

((بەرەو ژوورەوە ئەچێت))

Cut

دیمەنی – ٣٤ – ش/ن – مەخزەن:

Mute

(( خدر لە کاتی گواستنەوەی کارتۆنی چا فەلەکاندا، دەمی یەکێکیان ئەکاتەوەو بۆنی ئەکات و دەستی تێوەرئەدات تا بزانێ هەر یەکجۆرە.. پێی سەیر ئەبێ، ئاماژەی سەرسوڕمان ئەدات، کە هیچی لێ تێ ناگا، کەمێک دەست ئەخاتە ژێر چەنەی و بیر ئەکاتەوە.. دووبارە ئاماژەی هیچ تێنەگەیشتن ئەدات.. دەمی کارتۆنەکە وەک خۆی دائەخاتەوەو ئەیگوێزێتەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٥ – ش/ن – ماڵی مریەم:

(( چیمەن خەواڵوو، بە جلوبەرگی ماڵەوە، تێل ئەکا ))

مریەم (( ترس )): چوون بە دەوری پیکابەکەیا؟

سەمەد(( دەنگ )): نا نەخێر، بەڵام سەیارەی دنیا ڕاگیراوە، ئەڵێن نابێ هیچ سەیارەیەک دەربچێ، تا دڵنیایی ڕێگە وەرئەگرن کە پاککراوەتەوە.

مریەم: ئۆهـ نازانم بەچی بیت، خۆ منت تۆقاند.. وامزانی هەر پیکابەکە ڕاگیراوەو گومانیان لێی هەیە.. کێشە نییە، هەر ڕێگە کرایەوە دەرچن.. منیش کاتەکەیان پێ ئەخەمە لای نیوەڕۆ.. ئاگاتان لە خۆتان بێ.

(( ئەچێتەوە جێگەکەی بۆ نوستن ))

Cut

دیمەنی – ٣٦ – ڕ / د – ڕێگای دەرەکیی:

(( سەرەو مالە لە سەیارەیەکدان، لەسەر ڕێی گڵ))

سەرە: ئا ئا خۆی وتی شتێکی باشی بۆ ئێمە تیایە.

مالە: ئەم هەتیوە زۆر زۆرزانە، وریابە ئەبێ زۆر بە وریاییەوە لەگەڵیا بجوڵێینەوە.

سەرە: ئەوە بۆ لای خۆمان باش بوو، هەزار فرتوفێڵی لە ژوور سەرایە، ئاگاداریم خەمت نەبێ.. ئێوارەش کە چووینەوە کەمێکی تێهەڵئەدەم، بەڵام لای کاک ڕێشار باسی مەکە، وتی عەزێتی نەدەن.

مالە: کورە نەوەڵا لە دەمم نایەتە دەرەوە.. با یەکجار مسۆگەریش نەبێ لەوەیا کە باشین لەگەڵیا.

سەرە: نابێ وابێ.

مالە: ئەی چی لە کابرای خاوەن لۆرییەکە بکەین؟

سەرە: یەک یەک، خەمی ئەوەشت نەبێ.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٣٧ – ڕ/ن – ژووری عمید سەرکۆ:

(( عمید سەرکۆو نەقیب ڕاهۆز دانیشتوون.. لەسەر قطعەی بەردەمی نوسراوە: عمید سەرکۆ فرج طه))

ڕاهۆز: جا گەورەم ئەوەی تۆ باسی ئەکەی گروپی مافیان و بە ناوی کۆمپانیاوە بە ئیسراحەت ئیشی خۆیان ئەکەن.

سەرکۆ: بەڵێ، ناوی وەهمی زۆریشیان پێشکەش کردووە، بە هەمان دەستورو کلێشەی کۆمپانیا، ئەوەی ئەوان ئەیکەن، تەنها کاری کۆمپانیایی نییە.

ڕاهۆز: ئەی بەڵێ گەورەم شارەکە پڕە لە کۆمپانیاو زۆر بە ڕێک و پێکیی ئیشی تایبەتی خۆیان ئەکەن و خواخوایانە کەس نەکاتە سەریان، نەک بکەنە سەر خەڵک و بازاڕ قۆرخ بکەن.

سەرکۆ: کێشە نییە.. دۆسیەیەکیان بۆ ئەکەینەوەو لە کەمترین ماوەدا چارەسەریان ئەکەین.. ئێستە هەندێ کارمان لەسەر کردوون، بەڵام لێپرسراوێکمان بۆ دۆسیەکە دانەناوە.

ڕاهۆز: گەورەم ئەتوانم ئەو داوایەت لێ بکەم، ئەو شەرەفە بە من بسپێریت؟

سەرکۆ: ئەگەر لە خۆت ڕائەبینی، ئەبێتە تێستێک بۆ تۆ، زۆر باشە.

ڕاهۆز: بەو هیوایەی لە ئاستی پێویستدا بم.

سەرکۆ: یەک دووانێکمان هەن لەو دەوروبەرە، ئەوانیش هەواڵەی تۆ ئەکەم بە هیچ جۆرێک پەیوەندیتان لە نێوانا دروست نابێت، تەتەری زارەکیی تایبەتتان هەیە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٣٨ – ڕ/ د – بەر دوکانی ئامۆو ئاوا- فرۆشتنی شمەکی کارەبایی:

((محە ناشوکر لەبەر دوکانی ئامۆو ئاوا دانیشتووە.. دارەوان دێتە لایەوە، بە چیچکانەوە دائەنیشێت))

دارەوان: محە گیان بەرەو کوێ ئەچین؟!

محە: بەرەو کوێ؟! باوەڕ ناکەی پێش مردن ژیان چەند شیرینترە؟! تۆ وا ئەزانی کەسێک ئەمرێ دڵی خۆشە؟.. نا برا نا.. ناچارییە، ئەشزانێ ئەمرێت و ژیان جێ ئەهێڵێ بە ناچاریی، بەڵام هیوایەکی هەر هەیە.

دارەوان: باسی مردن مەکە! ئەزانم، وا ئەزانی لە پەنا گوێتایەو ئەیلاوێنیتەوە..

محە: بەوەی باشە وا ئەزانی زۆر لە تۆوە دوورە؟!!! هههە.

دارەوان: نا.. هەر ئەوەیە من گوێی نادەمێ و تۆش بەردەوام لەبیرتە!

محە: خۆزگە وا بووایە.. دارەوان گیان.. من سێ منالم بەدەستی خۆم ناشت، تۆ ئەمە ئەزانی، تەرمی ژنەکەمم هەر نەبینییەوە، ئەوەش ئەزانی! دایک و باوک و خوشک و برام، خۆم پرسەم بۆ گێڕاون.. ئیتر ئەبێ چ باکم بە مردن بێ؟..

دارەوان: کورە محە گیان ئەوەندە دنیا بە کۆڵەوە مەگرە مە.

محە: نا.. من محە ناشوکرم، قەت لە خۆوە قسە ناکەم.. غایەڵەی زۆر بە مێشکما دێ.. ئەم قسانەم بۆ تۆ بوو بێ مێشک.

دارەوان: هههە بێ مێشک؟ .. چییە مردن ئەمگاتێ؟!

محە: نازانم.. خۆت وریای، لێم تێ ئەگەی.

دارەوان (( پارەیەکی بۆ دەرئەهێنێ)): بگرە ئەمەش بخۆ تا پێت نەگەیشتووە.. با کە مردی شتێک لە گیرفانەکانتا بێ. هههە

محە (( لێی وەرئەگرێ)): سوودی نییە، سوپاس ئەمڕۆو سبەی پێ بەڕێ ئەکەم.. (( دارەوان هەڵئەسێ)) تۆش ئاگات لە خۆت بێ.

دارەوان: سوپاس محە گیان، هیچیترت ناوێ؟ ئەچم سەرێکی کوڕەکان ئەدەم.

محە: جا وا ئەمڕۆش سەرتدان! ئەی سبەی؟ دوو سبەی؟ سێ سبەی (( دارەوان لەناو حواری ئەمدا ئەڕوا)) ئاااای داماو، چەند گەشبینیت؟!!!

Cut

دیمەنی – ٣٩ – ڕ/ن –کۆمپانیای زوبێر:

(( هەندرێن دەستی لەنێوان ڕانەکانیا گرمۆڵە کردووە، وەک دڵەڕاوکێ و سازش کردن بۆ زوبێر))

زوبێر: ئیشەڵڵا باش ئەبێ.

هەندرێن: دەستت ماچ ئەکەم گەورەم.

زوبێر: مەڵێ گەورەم پێم خۆش نییە، هەر بە ناوی خۆمەوە ناوم بێنە.

هەندرێن: بەڵێ بەسەرچاو گەورەم.

زوبێر: وتم گەورەم نا.. هەر کاک زوبێرو بەس.

هەندرێن، بەخوا ناتوانم وا نەڵێم گەورەم.

زوبێر: ئەوە گوناهی تۆ نییە.. زۆرێک لە بودەڵەکان، خۆیان بە گەورە نیشان ئەدەن.. ئیتر کەسانی وەک تۆی نەفامیش نازانێ کەس گەورەی کەس نییە، هەموو مرۆڤین، هەندرێن پارەو دەسەڵات من ناکا بە گەورەی تۆ بەساقەوبم، ئەوە تەنها خۆ بە بچوکزانینی تۆیە، کە من ئاوا بە گەورەی خۆت ئەبینی.

هەندرێن: ئیتر من زمانم وا ڕاهاتووە گەورەم.. فەرموو ئەمرکە، کاک دارەوان تەلەفونی بۆ کردم وتی جەنابت کارت بە من هەیەو پەلەیە.

زوبێر: بارێکمان هەیە، لەودیوی سنورەوە دێت و تۆ وەریئەگری.. بە بێ فرت و فێڵ، ئەو مادەیە تەواوی گومرگ ئەکەیت و وەسڵێکی ٣٧ ئەلفی پاکم بۆ ئەهێنیتەوە.

هەندرێن: بەخوا گەورەم، ئیشی فێڵ و ساختەم پی خۆش نییە.. تەواوی گومرگ ئەکەم.

زوبێر: زۆر باشە منیش ئەوەم ئەوێ.. لە پێناسە ئەلکترۆنییەکەدا بە ڕوونی هەیەو لێرەوە پارەی تەواو بەرە.

هەندرێن: بۆ کەی گەورەم؟

زوبێر: دوو سبەی شەبەقیی لێرەوە دەرئەچیت و سەعات ١٠ لەسەر مەرز ئەبی، وەریئەگریت و ئێوارە ئەبێ لەشار بیت.

هەندرێن(( کەمێک قەلەقیی)): گەورەم ئاخر باوکم هەر لە بوژاندنەوەیە!

زوبێر: خەمی باوکتت نەبێ.. یەکێکم بۆ ڕاسپاردووە لە خۆت باشتر خزمەتی بکاو ئاگای لێی بێ.

هەندرێن: ئەک ماڵت ئاوابێ گەورەم.

زوبێر(( وەرەقەیەک ئەنوسێ)): ئەم پارەیەش جارێ لەودیو وەرگرە با پێت بێ، کە هاتییەوە هەقی خۆتت بە تەواوەتی ئەدەمێ.

هەندرێن(( دڵخۆش)): دەستت ماچ ئەکەم گەورەم، خوا بۆ ئێمەت بهێڵێ زۆر ممنونم.

زوبێر (( نیگەران)): ڕۆڵە بۆ ئەوەندە خۆت بچووک ئەکەیتەوە؟ من ئیشم بە تۆیە.. منم پێویستە لەسەرم هەقی خۆتت بدەمێ.. تۆ پارەی ڕەنجی شانی خۆتە وەریئەگری؟!

هەندرێن: ڕاست ئەکەی گەورەم، دەستت ماچ ئەکەم، خوا لە کیسەو باخەڵتی بەزیادکا.

زوبێر: دەبڕۆ عەمرت نەمێنێ، بەخوا تۆ بە من تێناگەیەنرێی.

(( هەندرێن بە ممنونییەوە ئەڕوات، زوبێر سەر با ئەدا))

——————— Cut ———————

دیمەنی – ٤٠ – ڕ/ن - ماڵێکی هەژارانەی ڕۆستەم:

(( حەمە خدرو ڕۆستەم بە پێوەن ))

حەمەخدر (( پەلەیەتی بڕوا )): کاکە من ناتوانم زۆر بمێنمەوە، ئاخر بژێویم لەسەر ئەوەیە.. تێگەیشتم کاک زوبێر ئێوەی داناوە دوور بەدوور ئاگاتان لە بارەکانی بێت.

ڕۆستەم: ئا، بەس ئەوە کەی ئیشە؟ ئەڵێ نابێ وا خۆتان نیشان بدەن کە من ئەناسن.

خدر: ناهەقی نییە، گەر ڕێشار بزانێ خەڵکی وەک ئێوە ئیشی بۆ ئەکەن، ڕەنگە حسابێکیترتان بۆ بکات و دوور نییە لەناویشتان بەرێ، جا ئەمە بۆ؟

ڕۆستەم: حەمەخدر من و تۆ خزمی یەکین و باشم ئەناسی کە یەک زەڕە حساب بۆ کەس ناکەم.. وەڵا گەر مەسەلە ئەوەبێ، بە بەرچاوی ئەو ڕێ لادێیەوە مامۆستا زوبێر بە کۆڵ ئەگێڕم.

خدر: هههه جوانە ڕێی لادێ، کابرا ناوی ڕێی شارەو کردت بە ڕێی لادێ.. تۆ بۆ قسە ناگەڕێی هەهە

ڕۆستەم: گەڕانی ناوێ، دیارە ئەوەندە شاخاویی بوون، کە بزنەڕێیەکیان بینیوەتەوە، وایانزانیوە ڕێی شارە هههە ئیتر کوڕەکەیان بەو ناوەوە ناوناوە.

خدر: نا نا وەک بیستوومە نازناوەکەیەتی.

ڕۆستەم: ئەهـ براڕۆ، ئەبێ خۆی ناوی چی بێ هههههە.

خدر: دەی کاکە من ئەڕۆم.. هەر وتت ئیش ئیش، ئەوە ئیشم بۆ دۆزیویتەوە، بەس توخوا ئەمەش مەکە بە ئیشەکانیترو تۆتکە بگرە. کاک زوبێر پیاوێکی باشەو ئیشی خراپتان پێ ناکا، هەرچییەک بوو ئاگادارم بکەرەوەو من هاوکاریت ئەکەم.. ڕێزی ئەو پیاوە بگرە، باشت ئەژێنێ.. وابکە متمانەی زۆرت پێ بکا، من ماوەیەکە لەوناوەم کەس خراپەیەکی نەوتووە.

ڕۆستەم: نا نا من خۆم بە تۆ سپاردووە، هەرچییەکت پێوتبم، بەو سالمە گێژەی هاوڕێشم وتووە وابکا، هیچ خەمت نەبێ حەمە خدر گیان.

((لە میوتیدا دایالۆگ و خدر ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٤١ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن عەلاگەیەک خۆڵ ئەهێنێتە دەرەوە، بیکاتە تەنەکەی خۆڵی بەردەرگاوە.. گێلاس ئەبینێت، عەلاگەی سەوزە لە سەیارەکەیان دائەگرێت))

نارەوەن: ئەوە نەتانگۆڕی گێلاس گیان؟

گێلاس: ناوەڵا نارەوەن گیان بە هیچ ناگۆڕرێ.. بەخوا بشیگۆڕین هەروەکو خۆی لێ دێتەوە.

نارەوەن: نا نا یەکجار وا نییە ماڵم ئاوا کردی، هەر بیگۆڕن باشترە.

گێلاس: نا بەخوا نارەوەن گیان.. شوێنەکەی خراپە، ڕەشەباکە زۆر ئەیگرێتەوە، ئەوە بە کوڕەکانم وتووە چاکی بکەنەوە، با بزانین ئەمجارەش چەند بڕ ئەکا؟!

(( سەیارەکەی تایەر بە بەردەمیانا ئەڕوات))

نارەوەن: وەڵا من بە دارەوانم وت بیگۆڕێ و یەکێکیتر بکڕێ، ئیتر وا جارێ عەیبی نییە، دەی چی خێری تیایە خوا ئەوەتان بۆ بکا، بەس ئێوەش وابکەن، بە قسەم بکەن. گێلاس: کچێ تۆ مشووری ئیشکەرێ بخۆ، ئەوە ئاسانە، چاکی ئەکەم.. ئیشکەرێ بۆ ناگری، بەڕاستیخزمەتی ئەو سەرا گەورەیە بە تۆی تەنیابالْ ناکرێ.

نارەوەن: کچێ بەخوا لەکەس ئەمین نیم بیهێنمە ماڵەکەوە، شەو و ڕۆ بە ئارەزووی خۆی بێت و بچێ.. ئەوە ئاڵتون هەیە، جومعەو جومعە دێت هەموویم بۆ پاک ئەکاتەوەو لە نێوانیشمانا دەرنەچێ، بە چێشتی دەستی کەس ڕازی نیم.

گێلاس: ڕاستە ئەوەش هەیە ((نارەوەن ئەچێتە ژوورەوەو گێلاس لەبەرخۆیەوە)): ئاهـ خوایە لەم ژنە چەند خۆی لە شت هەڵئەقورتێنێ و ئەقڵی خۆی چەند لا پەسەندە، ئوووهـ ڕەزات خواتەوە.

Cut

دیمەنی – ٤٢ – ڕ/ د – بەردەمی چایخانەکە:

(( ئەردەڵان بەدیار عەرەبانەکەیەوە دانیشتووەو بە بەردەکانی دەستی یاری ئەکا.. لە بەردەمی چایخانەکەدا.. هاوڕێ دێتە بەردەرگاو لەگەڵ شۆفێرێکا قسە ئەکا ))

هاوڕێ: وەرە باوکەکەم وەرە، ئەوە حەماڵ.. (( بۆ ئەردەڵان )) هەستە ئەردەڵان وەرە، ئەم پیاوە باری پیکابێکی پێیە ئەیبا بۆ حاجی حەمەوەیس، تەممەڵیی مەکەو بە گورجیی بۆی داگرە.

ئەردەڵان(( هەر بە بەردەکانەوە خەریکە)): بەسەرچاو بەسەرچاو، هەرئێستە، با تیلەش بکەم.

هاوڕێ: دەهەستە نەگبەتی کوڕی نەگبەت.. تیلی چی کابرا وەستاوە چاوەڕوانی تۆیە.

ئەردەڵان: وا هاتم ئەها ئەهـ.

هاوڕێ(( لە خۆیەوە)): ئای سەرچاو حەمە خدر گیان.

ئەردەڵان(( بە پەلە بەردەکان فڕێ ئەدات و عەرەبانە ئەجوڵێنێ)): فەرموو برا فەرموو.. ئەی حمەخدر کوا؟

هاوڕێ: تۆ جارێ بچۆ بەلای ئیشەکەتەوە، دوایی پێت ئەڵێم.

(( ئەردەڵان و کابرا ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٤٣ – ڕ/ن - ماڵی هەندرێن:

(( تافان نزیکی ملیۆنێک دیناری بەدەستەوەیە، یاری بە لێوارەکانی ئەکا، دڵخۆشە، سەیری هەندرێن ئەکا..))

تافان: ئێ!!

هەندرێن: خەرجیی باوکیشم ئەکەن لە خەستەخانە.

تافان: بەخوا باشە..

هەندرێن: کرمانجیشم بینی ئەوی لای ڕێشار.

تافان: ئێ، ئەو ڕەزا قورسەکە.

هەندرێن: ئافەرین، چاکت ناسییەوە.

تافان: ئەی خۆت پێت نیشان نەدام وتت بەس ئا ئەمانە ئیشیان بکەوێتە من باشە؟

هەندرێن: دەی ڕێک ئیشیان کەوتۆتە من!

تافان: چۆن؟ ئەوانیش باریان هەیە؟

هەندرێن: نا بەساقە، وتی ئەرێ ئەو ژنەت دەرچووی کوێیە؟ وتم ژمێریاریی.. وتی دەی گەر دڵتان پێوەیە، ئێمە بەدوای ژمێریارێکا ئەگەڕێن، ئەو ژنەی لەوێ بوو بەهۆی منداڵەوە بۆی ناکرێ.

تافان (( دڵخۆشتر)): ئۆی یەعنی ئیشم دەست ئەکەوێ؟ (( سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان)) ئای خوایە گیان زۆر سوپاس بۆ تۆ.

هەندرێن: تۆ جارێ پەلە مەکە.. ئاخر لەگەڵ ئەو ڕەزاقورسەیا ئیدارە ئەکەی؟

تافان: جا من ئیشم بەو چییە؟ دەوامی خۆم ئەکەم و ئەگەڕێمەوە. ئەرەوەڵا هەر زۆر باشیش ئیدارە ئەکەم، ئەوە ئیشەو خوا ناردوێتی. تۆ سەیریکە.. ئێمە چاوەڕێی بەختەبارانێکمان ئەکرد؟ کەچی وا کردی بە بەهار، هەر خۆش ناکاتەوە. ــــ Cut ــــ

دیمەنی – ٤٤ – ڕ / د – ناو سەیارەی مریەم:

(( مریەم سەیارە لێئەخوڕێت و زەنگی تەلەفونی بۆ دێت))

مریەم: سەمەد؟؟؟ (( سوکی ئەکاتەوەو لە شوێنێکا ئەوەستێ)) ها باوکە؟!

سەمەد(( دەنگ)): کاتت هەیە دادە مریەم گیان؟

مریەم: بەڵێ، قسە بکە.

سەمەد: ئەزانی ئەمجارەیان چی ڕوویداوە؟

مریەم: هەر نەڵێی گیرا.. بیکە بە خاتری خوا!

# (( ئەڵقەی سێ ))

سەمەد: نا دادە مریەم ئیشەڵڵا ناگیرێ، بەڵام جادە تەڕوتووشیان بوو، خزاو کەوتۆتە کەنێکەوە، وا خەڵکیش کۆبوونەتەوە بیهێنینەوە سەر ڕێ.

مریەم: وەرگەڕاوە؟

سەمەد: نا، هەر شانی داداوە.

مریەم: کرێنێکتان بۆ نەنێرم؟ دوورن؟

سەمەد: نا نا نزیکین، هیچ نییە، هەر کەمێکمان دوا ئەخا وتم با بیزانی.

مریەم: سەیتەرەتان لە پێشەوە ماوە؟

سەمەد: ئەگەر نەمایە ئەومان بەجێ ئەهێشت و خۆمان ئەمانهێنا.

مریەم: تۆزێ دەستوبردکەن، کابراش چاوەڕێیە.

سەمەد: هەر یەک سەیتەرەمان لە پێش ماوە.. هەر بیبڕین، شتەکە ئەهێنمە لای خۆم و بە فڕکانێک ئەیگەیەنمە دەستی خەمت نەبێ. ———— Cut ————

دیمەنی – ٤٥ – ڕ/د - بەر خەستەخانە:

(( ڕێژوان چاو ئەگێڕێ، وەک چاوەڕوانی کەسێک بکا.. سەلوا بەرەو پرسگەکە دێت و ئەوان ئاماژەی ئەکەن کە ئەو کوڕە داوای کردوون))

(( دوای سڵاوێکی کورت))

سەلوا: فەرموو کاکە؟!

ڕێژوان (( بە شەرمەوە)): من کوڕی کاک زوبێرم کۆمپانیای بازرگانییمان هەیە، باوکم ڕایسپاردم کە لە بری کاک هەندرێن، نازانم چی تۆ ئەکا؟!

سەلوا: کاکمە.

ڕێژوان: خوا لێت نەسێنێ.

سەلوا: زۆر سوپاس. بەڵێ شتێکی بۆ باسکردم.

ڕێژوان: بەڵێ.. باوکم ڕایسپاردم لەبری کاک هەندرێن، ئەم ماوەیەی باوکتان نەساغە، ئاگام لێتان بێ، کاک هەندرێن باری هەیە، تا سەر سنوور ئەچێ، ئەم دوو سێ ڕۆژە زۆر سەرقاڵ ئەبێ. (( پارەیەک دەرئەهێنێت نزیکەی ٥٠٠ هەزارێک)) باوکم ئەمەشی پیا ناردن بتاندەمێ، تا کاک هەندرێن ئەگەڕێتەوە، بۆ خەرجیی.

سەلوا(( پارەکە وەرناگرێ)): نا براکەم زۆر سوپاس هیچمان پێویست نییەو پارەی کەسیشمان ناوێ شوکور زۆرە، ماڵتان ئاوا بێ یاخوا.

ڕێژوان: نا دادە گیان، منەتی تیا نییە، ئەمەش هەر پارەی کاک هەندرێنە لای باوکم بوو، کاک هەندرێن وتی بیدە بە ماڵی باوکم، بەڵێ کاک هەندرێن خۆی وای وت.

سەلوا: هیچی لە بارەی پارەوە پێ نەوتووم.. ببورە ناتوانم وەریگرم.

ڕێژوان: باوەڕ بکە خۆی وتی با ئەو پارەیە خەرجکەن تا ئەگەڕێمەوە.

سەلوا: باشە من بە تەلەفون قسە لەگەڵ کاکما ئەکەم.

ڕێژوان: باشە بە دڵی خۆت. بەس ئەمە ژمارەی مۆبایلەکەمە با لات بێ، هەرچییەک پێویستی کرد، پەیوەندیم پێوە بکە، وەک کاک هەندرێن لە خزمەتتانا ئەبم.

سەلوا(( ژمارەکەی لەمۆبایلی خۆیدا ئەنوسێ)): زۆر سوپاس براکەم، ژمارەکە چەند بوو؟

Cut

دیمەنی – ٤٦ – ڕ/ن – نزیکی کۆمپانیاکەی ڕێشار:

(( خدر٢، بە چاکەتوپانتۆڵێکی شیک و بۆینباخەوە.. سمێڵ و سەکسوکەی صناعی پێوەیە، عەینەکێکی ڕەش لە چاویاو باڕوکەیەکی بەسەرەوەیە، ئەسڵەعیەکەی دیار نییە، دەنگی کەمێک ئەگۆڕێت وەک بە شێوەزاری ڕۆژهەلأت قسە بکا.. لە کۆمپانیاکە ورد ئەبێتەوە، ئەزانێ کرمانج ئەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیا، خۆی نەشارەزا نیشان ئەدا))

کرمانج (( کەمێک دیقەتی ئەداتێ)): فەرموو برا، ئەمرێکتان هەبوو؟

خدر٢: خواهیش دەکەم.. ئێوە لێرەن؟

کرمانج: بەڵێ، فەرموو ئەمرکە .

خدر٢: وەلأهی هێندێکم ئازوقە دەوێن، تۆ بلێی لەکنەنگۆ چنگ کەوێ؟

کرمانج: وەکو چی؟

خدر: ڕاستیەکەی چام دەوێت، بڕێکی زۆرم پێویستە .

کرمانج (( بە خەندەوە)): فەرموو برا با بچینە ژوورەوە، بەڵێ تەواو هاتوویت .

خدر: ئاغا زۆر مەمنوونم.. فەرمووو!

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٤٧ – متبوع - ڕ/ن- کۆمپانیای ڕێشار/ ژووری کرمانج:

(( کرمانج و خدر٢ دێنە ژوورەوە مالەش دوایان ئەکەوێت بۆ گوێگرتن.. دائەنیشن))

خدر٢ (( دوای سلاوو بەخێرهاتن)): ئەمن نێوم فەخرەدینە، هەر بە فەخە شینباو نێوبانگم هەیە، نازانم بۆ ئەو نێوەیان بەسەردا بڕیوم، هههە لەبەر ئاوێنەی زۆریش چاو لە خۆم دەکەم کەچی شینباو دەرناکەوم هههە .

کرمانج(( خەندەیەک)): هەهە شینباوی چی برا؟ ماشەلات لێ بێ، بێ عەیبی.. منیش ناوم کرمانجە ئیدارەی ئێرە بەڕێوە ئەبەم، خاوەنی کۆمپانیاکە کاک ڕێشارە .

خدر٢: ئۆو نێوبانگیم بیستووە بەلێ.. سەرچاوم کاک کرمانج .

کرمانج: نەتفەرمووە چ جۆرە چایەکت ئەوێ؟

خدر٢: لە کن ئێمە بۆ چایەک دەگەڕێن، پاکەتیی بێت و هەلڕژابێ، ئەوە دەست دەکەوێ؟

کرمانج (( پێکەنین و خەندە)): بەلێ بەلێ بە ئاسانیی، لەم ڕۆژانەدا بە هەلە نزیکەی سەد سندوقمان لە پاکەت هەلپچڕی. هههە وا تۆش بۆ ئەوە هاتووی .

خدر٢: باشە من نازانم ئەوە دەبێ چ سرڕێکی تێدابێ ئاوا پاکەتیی هەلدەپچڕن ؟

کرمانج: ئەوەم نەبیستووە، بەلام وەک وتم ئەوەی ئێمە بە هەلە ڕوویداو من سەرم تێینا .

خدر٢: ئەههە ئیشتیبایی بوو؟

کرمانج: بەلێ بە هەلە.. نرخی خۆشی بۆ نەگرتینەوە، من چوزانم تۆ بەدوایا وێلی؟
خدر٢: نا ئەمن هەر بە قیمەتی چای هەلڕژاو دەیکڕم.. ناتوانم بە قیمەتی زیاتر حیسابی بکەم .

کرمانج(( هەلئەسێ)): دەی ئەوەت قەت دەستناکەوێ، بڕۆ سەرێکی کاک حەمەوەیسی بدە لەناو بازاڕەکەیا، ڕەنگە ئەو هەندێکی مابێت .

خدر٢(( هەڵئەسێ)): زۆر چاکە... تەشەکوور دەکەم و زۆر مەمنوونم کاکە گیان. (( ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٤٨ – ڕ- عەسر/ ن – قاوەخانەی تریفە:

(( بێستانی جوان، تەمەن ٤٠- ٤٥ ساڵان و ئەنیق.. لەگەڵ تریفە لە جێی کاشێر.. خەڵک ڕۆشتن و وەڵامدانەوە))

تریفە (( نەرم پێکەنین)): هیچ ڕۆژێک وەک ئەمڕۆ داوای کۆدی خەتەکەیان نەکردووە، ئیتر مەیە بەساقە، خەتەکە خاو ئەبێتەوە هەهە.

بێستان (( ناز)): یەعنی بۆ ببینیی من دێن وانا؟ توخوا لەسەر خۆتەوە وا بە من ئەڵێی.

تریفە: خۆشت ئەزانی وا نییە، دەی جانانەییم بەسەرا بکە.

بێستان: تۆ پێم بڵێ ئیشێکت بۆ نەدۆزیمەوە.

تریفە: نەبەخوا هەموو ئەوەی ئەیناسم پێم وتوون.

(( دارەوان دێت و دوای سڵاو))

تریفە: باوە هیچت بۆ نەکردم بۆ بێستان؟

دارەوان: کچێ ئەوە بە دایکت بڵێ یەکسەر ئیشی بۆ ئەدۆزێتەوە هەهە دنیا ئەناسێ و زۆر سەیرە لەگەڵ هەموو کەسێکیشا باسێکی هەیە هەهە. نەبەخوا هەر هیچ ئیش نییە.

تریفە: وەیش لە دایکی داماوم، هەر زۆر دەمێکە پێم وتووە، ئەوە هەر تۆ وای ئەناسی، ئەگینا بەخوا زۆر داماوە.

بێستان: بەخوا نارەوەن خان ژنی چاکە، چۆن دڵت دێ وا ئەڵێی؟

دارەوان: جا خۆ خراپم نەوتووە؟ ئەوە جوانترین سیفەتیەتی کە زۆرم بە دڵە هەهە.

(( لە میوتیدا حوارو ڕۆشتنی دارەوان))

Cut

دیمەنی – ٤٩ – ڕ/ د – مەخزەنی ڕێشار:

(( دوو طنییەک دێت و لە بەردەمی مخزنەکە ئەوەستێ، ڕێشار بە سجلێکەوە لە تەنیشتییەوە وەستاوەو بە چیلکە دان پاک ئەکاتەوە.. دوو شاگردەکەی قاوەخانەی تریفە دەست ئەکەن بە بارکردنی کارتۆنە ئاو.. حەمە خدر و ئەردەڵان نزیک ئەبنەوە ))

ڕێشار: لێرە مەوەستن، ملتان بشکێنن، نابینن حەماڵی خۆی لەگەڵایە؟

خدر: نەک پێویستییەکیان پێمان بێ گەورەم. (( حەمەخدر زەنگی بۆ دێت ))

ڕێشار: هیچ پێویستیان بە کەس نییە، لاچن لەبەرلووتما، دە بڕۆن دەی، ملتان بشکێنن.

(( حمەخدرو ئەردەڵان ئەڕۆن.. خدر مۆبایل وەڵام ئەداتەوەو کرێکارەکان ئاو بار ئەکەن ))

تابع ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــ

دیمەنی – ٥٠ – متبوع – ڕ – لای ئێوارە/ د – دەرەوەی مەخزەن و دوور لە ڕێشار:

(( خدر دوورکەوتۆتەوەو وەڵامی تەلەفونەکە ئەداتەوە))

خدر: ماڵومناڵ باشن نارەوەن خان..... یاخوا باش بن...... جەنابت ئەمرەکەی لە خزمەتدام........ بەسەرچاو...... هەر لە قاتی یەک بۆ دوو؟ ..... هەر زۆر ئاسانە هەر بە پێڵووی چاو هەڵیئەگرم جەنابت ئەمرەکەی...... نا نا توخوا وا مەڵێ، بە هۆی جەنابتەوە خێری دنیام بەسەرا باریوە، خوا لێتان بەزیادکا خۆت و مێردت یەک لەیەک بەدەستودڵترن......... ئەمرەکەی، بەیانی سەعات ٨ لە ماڵی ئێوەم......... وایە وەڵا ڕاست ئەکەی ٩ باشترە، با بەردەمم چۆڵ بێ و بە خێرایی بیگوێزمەوە... بەسەرچاو.... بەسەرچاو..... ئەمرەکەی... خوا ئاگادارت بێ گەورەم.

(( مۆبایلەکەی هەڵئەگرێتەوەو ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٥١ – ڕ- لای ئێوارە – د/ نزیکی ماڵی دارەوان:

(( تایەر لە شوێنێکدا وەستاوە بە سەیارەکەیەوە ))

تایەر (( لەبەرخۆیەوە )): نا ئیتر باوەڕ ناکەم بیبینمەوە.. هەر فریشتە بوو خوا بۆ منی ناردبوو، شێت و هاری کردم ئەو ماڵ کاولبووە..... (( چاو ئەگێڕێ و دیار نییە، پیادەو سەیارە زۆرن ئەگەڕێنەوە بەرەو ماڵ )) دە تۆ سەیری ئەم هەموو قەرەباڵغییەش، وەڵا وابێ، تەنهاش بێ ناتوانم هیچی لەگەڵا بڵێم، مەگەر هەر سەیری بکەم و بەس.. دەی خوا بە هانامەوەو بێ و دەرفەتێ دروست بێ، دەی خوایە ئەوەم لەگەڵ بکەی..... (( پاش کەمێک تیرۆژ دەرئەکەوێت دێتەوەو نزیک ئەبێتەوە، بەڵام سەیارەو پیادە هەن.. تایەر ئەیەوێ دەرگای سەیارەکەی بکاتەوەو دابەزێ...

کە خەڵک ئەبینێت لە نزیکی خۆیەوە، پەشیمان ئەبێتەوەو دانابەزێ.. زۆر دیقەتی تیرۆژ ئەدات و سەری بۆ لار ئەکاتەوە، بەڵام ئەو نایبینێ... تیرۆژ بەرەو ماڵ ئەچێت و تایەریش وردەوردە دوای ئەکەوێ.. تیرۆژ هەستی پێ ئەکات و لە ڕۆشتنندا پێ هەڵئەگرێ خێراتر.. لەبەر دەرگا ئاوڕ ئەداتەوە، تایەر ئەبینێ کە پێ ئەکەنێ.. ئەچێتە ژوورەوەو بە توندیی دەرگا ئەدا بە یەکا، وەک نیشانەی بێزاریی.))

Cut

دیمەنی – ٥٢ – ڕ- ئێوارەی زۆر درەنگ/ د – بەردەمی تەنها ژوورێک لە گوندێک:

(( سەرەو ماڵە عەلاگەیەکیان پێیە دیارە لەفەو هەندێ دەبەئاوی تیایە))

سەرە: من بچمە ژوورەوە خراپی پێ ئەکەم.

ماڵە: وا نابێ، پێکەوە ئەچینە ژوورەوەو ناهێڵم زڵلەیەکیشی لێ بدەیت.. کاکە ناوێرم لە قسەی کاک ڕێشار دەرچم.

سەرە: ئەی خۆ ئەتوت بیکوتە! پەشیمان بوویتەوە؟

ماڵە: بەڵێ پەشیمان بوومەوە.. با توش نەبین سەرە گیان.

سەرە: وەڵا چاک خۆمم بۆ ئامادە کردبوو، کەوایە من نایەمە ژوورەوە، دەمامکەکەت ببەستەو خۆت بچۆ.

ماڵە: ڕاستت پێ بڵێم؟ لێی ئەترسم، زۆر فێڵباز دیارە.

سەرە: دەی منیش بێمە ژوورەوە خۆم بۆ ناگیرێ بەخوا زۆری تێهەڵئەدەم.

ماڵە: ئەی چی بکەین؟

سەرە: خۆت ئەزانی.

ماڵە: چۆنە لە پەنجەرە بچووکەکە بدەین بیکاتەوەو لەفەو ئاوەکە بدەینە دەستیەوەو بڕۆین؟

سەرە: دەی باشە وا بکە، با زووش بگەڕێینەوە.

ماڵە((ئەچێت لە پەنجەرەکە ئەدات و دەستێک ئەیکاتەوەو ماڵە عەلاگەکەی ئەداتێ)): ها بیگرە قوزەڵقورتیکە.

Cut

دیمەنی – ٥٣ – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر دانیشتووەو چیمەن، هەناسەسوارەو چای بۆ ئەهێنێ))

زوبێر: هەی ئافەرین کچە هەناسەسوارەکەم.. دەستخۆش هەی ئەو کچە باشەی کێشەکانت لە باوکی خۆت ئەشاریتەوە.

چیمەن: نا باوە گیان بڕوا بکە، کێشەم نییە، ڕەنگە سەرمام بووبێ.. ئەم دوو سێ ڕۆژە هەر کە ئیشێ ئەکەم، یان هەر بجوڵێم تەنگە نەفەس ئەبم.

زوبێر: ئیشکەرت ناوێ؟.. بۆ دەمەتەقێیەکیش باشترە.

چیمەن(( دەست ئەکاتە ملی باوکی)): نا بەساقەسەری باوکی خۆم بم.. ئەرکم گران نییە.

زوبێر: تۆ ئەزانی کتێب خوێندنەوە چەند بە سوودە؟ من بەخیلیت پێ ئەبەم کە ئەو هەموو کاتەت هەیەو دەست نادەیتە هیچیش.

چیمەن: بەدەست خۆم نییە بێتاقەتم ئەکا.

زوبێر: با بەدەست خۆتە، بەڵام فێری نەبوویت.. ئەزانی کتێب فێری هەموو شتێکت ئەکا.. بەوەشەوە پەیمانشکێن نەبی لەگەڵ باوکتا، کە بەڵێنت پێدابێ هەموو کێشەیەکی بۆ باس بکەیت.

چیمەن: تۆ خۆت کتێبی باوکە ڕووحەکەم، دەمێکە فێری ئەوەت کردووم.. فێری ئەوەشت کردووم لەسەر گومان بڕیار نەدەیت.

زوبێر: ئەی وەکو بزانیت باسی ئەوەشم بۆ کردووی کە هیچ دووکەڵێ بێ ئاگر نییە؟ مەبەستم ئەوەیە گومانەکە هەر لەسەر هەناسەسواریی بنیات نەنرابێ، بەڵکو ڕەنگ پەڕینیشی لەگەڵ بێ؟

چیمەن: ئەوەیان نازانم باوە گیان.. بەڵام پێت وتووم کە پیاوان ناتوانن هەموو فسیۆلۆژیای ژن بناسن، چونکە ژن نیین.

زوبێر: لەوە تێگەیشتم کچم.. تەواو تۆ بردتەوە.. ئەها ببینە باوکت بەو هەمووە تەمەنەوە پێداگیریی ناکا لەسەر ڕای خۆی! ئەبێ ئەوەش فێر بی.

چیمەن: بێگومان، تۆ هەروابوویت.

زوبێر: جا ئەوە باشییە بە ڕای تۆ؟

چیمەن: هەر زۆر زۆریش.. ئەی خراپییەکەی لە کوێیدایە؟

زوبێر: خراپییەکەی لەوەدایە چاکەم سارد بووەوە هەهەهە.

Cut

دیمەنی – ٥٤ – ش/ن- ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج..))

کرمانج: ئیتر تۆزێ لەمەوپێش هەندرێنی مێردی تەلەفونی کرد، داوای کاتی دەوامی ئەکرد، چەند بۆ چەندە؟ منیش وتم لە هەشتی بەیانییەوە بۆ دووی پاش نیوەڕۆ.. ئەگەر کاریشی نەبوو ئەتوانێ زووتر بڕواتەوە.. هەر زۆر زۆری پێ خۆش بوو.. یەکسەر ڕازیی بوو.

ڕێشار: پاشاش ناونیشانی کچێکیتری بۆ هەڵدام، نازانم کێیە.. ئەڵێ ئەویش بدۆزنەوەو بیخەنە کارەوە، گومانڕەوێنە.

کرمانج: ناوەکەو شێوەی ڕوخسارو شتێکمان بدەرێ نزیکمان بخاتەوە، زۆر ئاسان ئەبێ.

ڕێشار: ناوی ناوی ئا (( دەست ئەبا بۆ گیرفانی دەفتەرێکی بچووک دەرئەهێنێ و بۆی ئەگەڕێ)) لەم دەفتەرەیا نوسیومە، با بیدۆزمەوە... ئا ناوی بێستانە، هامشۆی کچەکەی دارەوانە قرخن ئەکا ئەوی قاوەخانەکە، لای ئەو ئەبینرێ.. زۆر جوانە.. هیچیتری لەبارەوە نازانم.

کرمانج: زۆر ئاسانە گەورەم، من شوێنەکە ئەزانم و هەر سبەی دوو سبەی ئەو ژنەی کە دێت بە ناوی بەخێرهاتنەوە ئەیبەین بۆ نانخواردنێک و لەوێشەوە بۆ قاوەخانەکە.. دوای ئەوە بە خۆمی بسپێرە، هەفتەیەکیتر نابا ئەویش دێتە سەرکار.

ڕێشار: هیچ هەڵەیەکم ناوێ.

کرمانج: بێخەمبە گەورەم.. ئەگەر ئەمرێکت نییە، من ئەچم سەرێکی سەرەو ماڵە ئەدەم، بزانم کابرایان بۆ بۆ هێناوینەتە ژێر بار؟

ڕێشار: ئەبێ ئەمشەو ئەوە بکەن، ئەگینا پاشا سەغڵەت ئەبێ.. گەڕاونەتەوە.

کرمانج: بەڵێ دەمێکە. ______________________ Cut

دیمەنی – ٥٥ – ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( دارەوان و ئامۆو ئاوا دانیشتوون))

دارەوان: بۆ ئێوە باشە، پێنج نهۆمە.

ئامۆ: هەر بە نرخی بازاڕ بیاندەینێ؟

دارەوان: ئەگەر شتێک کەمتریش بێ بەس زۆر نا.. ئاساییە.

ئاوا: باوکە! ئەی لە نەخشەکەیا مەوادی زۆری بۆ دانراوە؟

دارەوان: زۆر تێروتەسەل داوای کردووە، ئەیکا بە ئوتێل.. هەرچیتان هەیە ساغیکەنەوە بەسەرمانا هههە.

ئامۆ(( سوعبەت)): یاخوا هەرچی تەلاری ئەم شارەیە بدرێ بە تۆ.. (( نارەوەن دێتە ژوورەوە)) بە دوو تەلاری ئاوا خۆمان ئەگرین.. نارەوەن گیان بەڵێن بێ یەک دەست جلی کوردیت بۆ بکەم.

نارەوەن: چییە؟ یەعنی چەورە؟ ئادەی بزانم چەندتان دەست ئەکەوێ؟

دارەوان: ژنەکە ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نییە، جارێ خۆیان نازانن بایی چەندمان ئەدەنێ.. جا نەخوازەڵا دەسکەوتەکەی!!

نارەوەن: ئەرێ ئەوە تۆ بۆ ئەوەندە قسەی منت لەبەر گرانە؟! ئا ئا خۆ چاوی پیاما هەڵنایە (( دارەوان و کوڕەکان سەردائەخەن و تەماشای یەک ئەکەن و بزە)) شەو سەعات دوانزە بۆم دێتەوەو هەر لەگەڵ هاتیشەوە بە قسەی ڕەق دامئەگرێتەوە (( بێدەنگی و بزەی ئەوان)) ئەوە بە من پێ ئەکەنن؟ دەی سا وەڵڵاهی حەق و حسابی تەواوم پێ نەڵێن و خۆم وردبینیشی بۆ نەکەم، ئەمشەو ناهێڵم یەک کەس چاوی بچێتە خەو.

(( پێکەنینی باوک و کوڕەکان))

Cut

دیمەنی – ٥٦ – ڕ/ن – چایخانەکەی هاوڕێ:

(( هاوڕێ مەشغوڵە بە چا تێکردن و دانانەوە، محە ناشوکر لەسەر کورسییەک بە تەنها دانیشتووە، ئەردەڵان و چەند کەسێک هەن))

محە: ئاخر پێم ئەڵێن محە ناشوکر، وەک خۆیان بەردەوام شوکرانەبژێر بن؟! باشە شوکری من لە چی؟ بەرگ و سیپاڵەکەم، یان دەستکورتیم؟ لە ماڵە ئاوەدانەکەم، یان لە گۆڕە تەسکەکەم؟ من ڕۆژانە لە گۆڕەکەم ئەمهێننە دەرەوە، دوو تفم تێ ئەکەن و ئیتر تورِم هەڵئەدەن بۆ بەرپێی ئەوانیتر.

هاوڕێ: جا ئیتر بەزمە مامە محە.

محە: بۆ بەزم نەبێ هاوڕێ؟.. لای ئێمە خۆ گێلکردن و خۆنەبانکردن و خۆتەفرەدان هەر زۆر زۆرە، دەنا بەدزیی خۆمانەوە، هەموو ئەزانین بە زیندوویی چۆن کڵاوی مەرگمان لەسەرنراوە.. لێرە چەند کەسێک زیندووەو ئەویتر لە گۆڕی بەکۆمەڵدان و گاڵتەشیان بەیەک دێت (( قاقا لێئەدا، وەک لە بینی بگیرێ)) ئا ئا گاڵتەیان بە یەک دێت.

ئەردەڵان: ئەک ڕەحمەت لەو دایک و باوکەت! ئافەرین مامە محە ناشوکر.

محە(( سەردائەخات)): باش بوو تۆش پێتزانی لە مردووەکانی ئەردەڵان گیان.. ئەوانیتر وائەزانن ورێنە ئەکەم.

ئەردەڵان (( دێتە لایەوە)): محە گیان هەستە بچین بۆ کەبابخانەکەی ئەودیو، بەو قسە جوانانەت کەبابێکت مسۆگەر کرد.

محە (( پێئەکەنێ)): دەبا تۆزێ سەبر بگرین، بەڵکو سێ چوارێکیتریش غیرەت بیانگرێ و ئەوانیش سەرو کەبابم بۆ بکڕن.. ئاخر کەبابێ نیشانی کوێی ورگم بەم ئەردەڵان هههە.

ئەردەڵان: دەی منیش هەر ئەوە شک ئەبەم بەخوا.

(( بە پێکەنینەوە ئەچنە دەرەوە)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٥٧ – ڕ/ن – ناو سەیارەی دارەوان:

(( هەڵشۆو دارەوان ))

دارەوان(( گرژ)): سەد جارم پێوتی نە دێیت بۆ لای من نەبۆ لای نارەوەن و نە کوڕەکان.. هەتیو تۆ زۆر بێ گوێی.

هەڵشۆ: بە گۆڕی باوکم مامە تەنها بۆ ئەوە چووم بڵێم تریفە نەخۆشەو هیچیتر، وا ئەو کردوویێتی بەوەی دووبارە هەڵمکوتابێتە سەری.

هەڵشۆ: بۆ بەشەر لە سەردەمی کەیا ئەژیت؟ ئەزانم وەڵامی تێلی تۆ ناداتەوە، ئەی تریفە بۆ بۆی نەکرد؟

هەڵشۆ: بەخوا زۆرم لەویش کرد بۆی بکا.. وتی ئێستا خۆم ئەزانم چەند تووڕە ئەبێ، نەیوێرا،

دارەوان: وا مەکە لێت بێ ئومێد بم هەڵشۆ.. ئەگینا دارت بەسەر بەردەوە ناهێڵم، خۆ باش تێئەگەی؟

هەڵشۆ: هەر ئەمجارە بمبورە مامە گیان، بەڵێنت ئەدەمێ تا ماوم خۆم نیشانی کەستان نادەم، مەگەر بڵێم چۆن بێ.

دارەوان: باشە دواجار بێ داوای لێبوردنت قبوڵ بێ.. بڕۆ سەرقاڵی سەیارە کڕین و فرۆشتنی خۆت بە هەتیو! هێشتوومە پەکت بکەوێ؟

هەڵشۆ: نەوەڵا هەرگیز.. قوربانت بم مامە گیان.. تەواو تەواو!.. عەننابییە.

Cut

دیمەنی – ٥٨ – ڕ/ن – ماڵی مریەم:

(( مریەم دانیشتووەو سەمەدو کامیل بە پێوە پارە ئەخەنە گیرفانیانەوە.. جلی کوردییان لەبەرە))

مریەم: خۆ پێتان کەم نییە؟

کامیل: نەوەڵا لێت بەزیاد بێ هەر زۆر زۆرە.

سەمەد: بەڵام بۆ ئەو هەمووە دادە گیان؟ هیچ جارێک وا زۆر نەبووە.

مریەم: ئێوەش هیچ جارێک بەقەدەر ئەمجارە ماندوو نەبوون سەمەد گیان.

کامیل: توخوا لە بەشی خۆت نەدابێ بە ئێمە!

مریەم: نا کامیلی ڕووحەکەم، بەشی خۆم نادەم بە هیچ کەسێک هههە، بەڵام بۆ کابرام گێڕایەوە چەند ماندوو بوون بەو سەرمایە، حەزی کرد پاداشتتان بکا.

سەمەد: خۆ وا زوو نایەتەوە؟

مریەم: بەخوا دیارە بە کەمی ئەزانی، با شتێکیترت بۆ بێنم نەک ئیشت پێی بێ.

سەمەد: نەبەخوا زۆر زۆرە دەستت خۆش بێ، مەبەستم ئەوە بوو بچینەوە بەلای کاروکەسابەتی خۆمانەوە؟

مریەم: بەڵێ، منیش لێرە نامێنم و خانوەکەش بۆ خاوەنی چۆڵ ئەکەم.. تا ئیشیتر دروست ئەبێ، ئەوسا جوابتان لێ ئەگێڕمەوەو لە هەر شوێنێک بم، پێتان ئەڵێم.

Cut

دیمەنی – ٥٩ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( خدر لە دەرگا ئەدات و دەنگی دەرگا دێت و نارەوەن ئەیکاتەوە.. پاش بەخێرهاتنی ئاسایی))

نارەوەن: چارەکێ زووتر هاتی!

خدر: بەخوا بارێکی کاک دارەوانی مێردت هەیە، ئەبێ زۆر زوو بگەڕێمەوە فریاکەوم، بەس لەبەر خاتری جەنابت هاتم، ئەگینا هیچ کاتم نەبوو.

نارەوەن: دەی باشە، بەلاّم وا بکە لەگەڵ منا لە کاتی تەواوی خۆیدا بێیت، باش؟

خدر: بەسەرچاو گەورەم، جەنابت ئەمرەکەیت. هەر مەعرەزەکە یا تەلەفزیۆنەکەش ببەمە سەرەوە؟

نارەوەن (( بەدەم ڕۆشتن بۆ ژوورەوە)): نا هەر مەعرەزەکەم بۆ ببە سەرەوەو مەعرەزێکیتری لێیە، ئەوەی ئەوجارە خۆت بردتە سەرەوە، ئەوەم بۆ بێنەوە خوارەوە.

خدر: باشە بەسەرچاو، لە خزمەتدام، فەرموو.

نارەوەن: دەی تۆ بڕۆ خێرا ئیشی خۆت بکە، من ئیشی ترم هەیە.. (( خدر بە گورجیی ئەچێتە ژوورەوەو نارەوەن بە دوایدا.))

Cut

دیمەنی – ٦٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان و زوبێر دانیشتوون))

زوبێر: دوێنێ تەلەفونی بۆ کردم، وتی هەرچییەکت کردووە ئیشێکم بۆ بدۆزەرەوە، وا خەریکە لەماڵەوە ئەگەڕێمەوە بۆ چاخی بەردین هههە.

دارەوان: دوو ڕۆژێک ئەبێ، زۆر باسی ئیش ئەکا، تا ئێستا ئەم بەزمەی نەبوو.

زوبێر: جا با ئیش بکا، تازە تەمەنێکی زۆری بەسەر بردووە بە حاجەت شتن و ناوماڵ پاککردنەوەوە.. تۆ لەو باوەڕەدای هیچی بیر مابێ لەوەی خوێندوێتی؟

دارەوان: با ئیش بکا، منیش لاریم لێی نییە، ئەو تا ئێستا ئەیوت لەسەر وەسێتی باوکمە کە نامەوێ ئیش بکەم.. جا کە ئەو وەسێتی باوکی ئەشکێنێ، با ئیش بکا.. بەڵام ڕاستییەکەی من ناتوانم بڵێم ئیشت بۆ نادۆزمەوە.

زوبێر: نیازیشت نییە بۆی بدۆزیتەوە هههههە

دارەوان: نا هەرگیز.

زوبێر: دارەوان هەست ئەکەم تۆ لە هیچت کەم نەبێ و ئەو ژنەش لە سەروو تۆوە نییە لە هیچ شتێکتانا.. چۆنە وا ئەو هەمووەت داوە بە دەمییەوە؟ من کەزانیم ماوەیەک بوو ژنەکەم پێی لێ هەڵئەبڕی، جیا بوومەوەو تەواو.. ئێستا زۆر ئاسوودەترم.

دارەوان: زوبێر گیان، هەر کەس دەردی خۆی خۆی ئەیزانێ.. هەندێ شت هەیە، کە ئەبێ تا ئەمرم هەر خۆم بیزانم.. ئەوە وایکردووە هەندێک چاو بەرەو ژێری بم و دڵی ڕاگرم، وتم هەندێک.. مەبەستم ئەوەیە بڵێم زۆریشم نەداوە بە دەمیەوە.

زوبێر: ئادەی لە چیا نەتداوە بە دەمییەوە؟

دارەوان: بۆ نمونە ئەو تا ئێستاش ئەیەوێ ئێواران لەگەڵ بانگا لە ماڵەوە بم.. بێ ئەوەی بزانێ لە کوێم و هەرگیز پێشی ناڵێم، شەوانە من دوانزەی شەو ئەچمەوە.. ئەو تا ئێستاش بەو ئاواتەوەیە بزانێ چیم هەیەو چیم نییە، قەت نایزانێ.. دوکانم بۆ

مناڵ داناوەو قاوەخانەو خانووم بۆ کچەکە کڕیوە، بێ پرسی ئەو و ئاگاداری نەبووە تا خۆیان ئاشکرایان کردووە.. جا چی نا؟.. بەڵام کە ڕێزیشی ئەگرم، ئەویش هۆی خۆی هەیە.. کەسیش نییە ڕێزی هاوسەری نەگرێ.. تۆ ڕۆشنبیری برا.

زوبێر: نازانم، من لەو بڕوایەدام، داوای هەرچییەک بکا ناڵێی نا.

دارەوان: جا کەس هەیە ژنی داوای هەر شتێکی لێ بکاو بەدەستیەوەبێ و بۆی نەکا؟

زوبێر: کەواتە تۆش زاڵمی هههه.. من بە جۆرێکیتر تێگەیشتبووم.

دارەوان: جۆری چۆن؟

زوبێر: بۆ نمونە وامئەزانی ژیانت دۆزەخەو لە ترسیشا ناوێری هیچی لەگەڵا بکەی.

دارەوان: ئەگەر دارەوانت وا ناسیبێ، واتە هیچ سوودت لە هاوڕێیەتیی پەنجا ساڵەمان وەرنەگرتووە.. بە پێچەوانەوە زوبێر گیان.. هەر کەسێکیتر بووایە لە بری من، بێ پرسی ئەو ژنە پەنجەی نەئەکرد بە ئاوا.

Cut

دیمەنی – ٦١ – ڕ / ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( سەرە بە خێرایی دێتە ژوورەوە بۆ لای ڕێشار.. ڕێشار تەلەفون ئەکا ))

ڕێشار: تۆ وەرە بەساقە، کەی من درێغیم لێکردووی؟ ......... نا نا هەر خزمەتکارەکەی لێیە، خەمی ئەوت نەبێ، ئەوانیتر هەموو ئیزنەدەم.......... (( سەرە ئاماژەی بۆ ئەکا کە تەلەفونەکە دابخا ئیشی گرنگی پێیەتی)) باشە دڵی من، ئەوە خەڵک هات عەسر قسە ئەکەینەوە، ئەگەر سەرقاڵیش بووم ئەوە شەو چاوەڕوانتم.......... باشە گیان خواحافیز. (( بۆ سەرە بە تووڕەیی)) ئەوە هەتیوە خوێڕییە چەند جارم وت کە لەگەڵ کچان قسەم کرد نەوەستی؟

سەرە: گەورەم کەی کاتی کچانە؟ ئاسایشی ئابووری هاتوون.

ڕێشار(( هێمن ئەبێتەوە)): هیچی سەرپێچیمان هەیە؟

سەرە: ئەی چۆن مریشکەکان هەر لە مەخزەنن.

ڕێشار(( هەڵئەسێتە سەرپێ)): کوا لە کوێن؟ با بێنە ئێرە.

(( ڕێشارو سەرە بە پەلە ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٢ – ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( بێستان و تریفە دانیشتوون لە شوێنی کاشێر))

تریفە: ئا بێستان گیان، باوکم ئێرەی بۆ من و هەڵشۆی مێردم کڕیوەو بەڕێوەی ئەبەین.. قازانج و زەرەری هەر بۆ خۆمانەو هەر نایەت بە لاشماندا. باوەڕکە ئەم ئیشە هی خۆمان نەبووایە، منیش حەزم لێی بوو بێم لەگەڵتا.. ئەوان پارەی چاک ئەدەن.

بێستان: خۆزگەم بە خۆتان.. کاشکای منیش ئیشێکی وام هەبووایە..

تریفە: ئەو ئیشەت باشتر ئەبێ، من خۆم کاک کرمانج ئەناسم، کەسێکی باشە.

بێستان: نازانم دڵەڕاوکێیەکی سەیر گرتوومی.. نایانناسم، بەڵام هەر لە خۆمەوە پێی دڵخۆش نیم.

تریفە: دە قسەی وا مەکە.. ئەوان لای من بینیویانی و تۆیان چووە بە دڵا، ئێ تۆیان لە من بە جوانتر زانیوە، بۆیە وتیان ئەو کچەی ئەو ڕۆژە لات بوو.

بێستان: دووبارە وا بە من ئەڵێی؟ مەگەر کوێراییان داهاتبێت!

تریفە: نە بەخوا جوانی تۆ بە ناوبانگە بێستان گیان.

بێستان: ئاخر منیش لەو جوانییە سڵ ئەکەمەوە.. ئەترسم منیان بۆ مەرامێکیتر بوێ؟!

تریفە: من وا ئەزانم ئەوە بەدەست خۆمانە.. بڕوا بکە ڕۆژانە چەندین کەس کە دەم ئەکەنەوە، تێئەگەم مەرامیان چییە، هەر بە قسەی خۆشیش بە جۆرێک ئەماڵم بە لەوسیانا، خۆی زاتی ئەوە نەکا جارێکیتر نیازی وای هەبێ.. بڕوا بکە بەدەست خۆمانە... (( تەماشای دەرگا ئەکا، کرمانج و سەرەو مالە دێنە ژوورەوە)) ئەوە کاک کرمانج هات بێستان گیان، ئیتر خۆت سەرپشککە.

(( دێنە ژوورەوەو لە میوتیدا سەلام و دواتر بێستان ئەچێ لەگەڵیاندا دائەنیشێ))

Cut

دیمەنی – ٦٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان بە تەنها دانیشتووە تێل ئەکا.. خدر دێتە ژوورەوە کە مۆبایل ئەبینێ بەدەستیەوە ئەوەستێت، بە ئاماژە پێی ئەڵێ چیت ئەوێ، ئەویش ئاماژەی بۆ ئەکاتەوە پەلە نەکات تا لێ ئەبێتەوە لە تەلەفونەکەی... ئەمە لەناو قسەکانی دارەواندا دروست ئەبێ))

دارەوان: ئەوەندەی من بزانم پێویستی بە پشتگیریی کەس نییە، خۆی پشتگیری خۆیەتی هههه ......... ئەی چۆن برا، ماشەڵلای لێ بێ ئەڵێی کینداڵی خوشکی کیم کارداشیانە، ئەوانیش ئەوەیان ئەوێ..... نا نا خراپ تێ مەگە، من ئاگام لەوە نییە کێ ئەستێرەی جیهانییەو کێ ناوخۆییە، بەس ڕەسمێکی ئەو کینداڵەیان نیشاندام، هەر ئەتوت ئەوە.... پێی بڵێ بێ سێودوو وەرگیراوە....... ناوەڵا هههه نا نا من کەسم ناوێ براکەم، لەو عومرەیا نەماوم هههه..... باشە گیان خوات لەگەڵ.

دارەوان (( مۆبایل دائەنێ)): ها کورە!! تەواو بوون؟!

خدر: بەڵێ گەورەم تەواو بووین، بەس بنێشتەکە ٤ کارتۆنی کەم بوو.

دارەوان: ئا.. وایە.. دوایی خۆشی پێی وتم.. قەینا.. بڕۆ پارەی خۆتان وەرگرن.

خدر: ممنونم گەورەم بەزیاد بێ.. من کەمێک ئیشم هەیە ڕەنگە دوور بکەومەوە ئەگەر ئەمرێکت نەبێ.

دارەوان: نا تەلەفونەکەی تۆو ئەردەڵانیشم لایە، مەگەر شتی لەناکاو بێت، ئەگینا هیچ دیار نییە.

خدر: لەسەر ئیزنی جەنابت جارێ خواحافیز.

(( دارەوان وەڵامی ناداتەوە سەرقاڵی مۆبایلە.. خدر ئەڕواو دارەوان تەلەفون ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٦٤ – ڕ/ د – بەردەمی مخزنی ڕێشار:

Mute

(( سێ کەس بە جلی مەدەنییەوەو دوو پۆلیس، بە ئەردەڵانی حەماڵ و ئەحە، هەندێک مریشک لە مەخزەنەکە ئەهێننە دەرەوەو ماڵەو کرمانج بە دیاریانەوە وەستاون، هەندێک خەڵکیش سەیر ئەکەن.. ڕێشارو سەرە دەرئەکەون بە پەلە دێن))

_________ گەڕانەوەی هەیە _____________ Cut ___________

دیمەنی – ٦٥ – ڕ/ د – گوند:

(( مام تەیفور بەرەو ماڵی دیدەوان بە خێرایی ئەڕوات و بانگی ئەکا ))

تەیفور: مامۆستا دیدەوان، مامۆستا دیدەوان هۆو!! (( دووبارەی ئەکاتەوە ))

دیدەوان(( دێتە دەرەوە، بە دەنگی بەرز)): هۆو بەڵێ مام تەیفور، فەرموو!

تەیفور(( نزیک ئەبێتەوە)): ئەوە حەیوانەکان گەیشتن، تەلەفونیان بۆ کوڕەکە کردووە، ئەڵێن وا ئەگەین.. با بچین بۆ ناودێ.

دیدەوان: نەتزانی بایی چەند بوون؟

تەیفور: ناوەڵا با خۆیان بێن، فەرەجی کاکەوڵا کڕیونی و خۆیشی لەگەڵیانایە.

دیدەوان: هەر زۆر باشە.. پارەم بۆ داناون، گرنگ ئەوەیە زیادمان لێوەرنەگرن، خۆت شارەزای من سەواو مامەڵەکەی بە خۆت ئەسپێرم.

تەیفور: باشە بەسەرچاو، هیچ خەمت نەبێ.

(( پێکەوە بەرەو ناودێ ئەڕۆن))

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٦٦ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٤ –ڕ/ د –بەر مخزنی ڕێشار:

(( ڕێشارو ئاسایشەکان و ئەوانیتر پێکەوە وەستاون))

ئاسایش: ئێمە دەمێکە ئاگامان لە جموجووڵە گوماناوییەکانی تۆیە.. ئەوەتا هاتین بەسەر وەزعەکەیاو هەرچی وتراوە ڕاست دەرچوو.

ڕێشار(( کەمێک شڵەژان)): تۆ باسی چی ئەکەی قوربان؟

ئاسایش (( دەست ئەداتە مریشکێکی بەستوو)): بۆ چاو و ڕاومان لێ ناکەی بەساقە؟ هەموو ئەم مریشکانە ئێکسپایەر بوون. (( تاسانی ڕێشار))

# (( ئەڵقەی چوار))

ڕێشار: ئا وەرە کرمانج.

کرمانج: بەڵێ گەورەم.

ڕێشار: پێمنەوتی ئەو مریشکانە فڕێدە بەسەرچوون؟

کرمانج: بەڵێ گەورەم بەڵام بەخوا زۆر سەرم قاڵ بوو.

ڕێشار(( بۆ ئاسایش)): برا کەس هەیە ئەوەندە بێویژدان بێ خواردنی بەسەرچوو بداتە هاوشارییەکانی خۆی.. ئەگەر بە تۆسقاڵ دەسکاریی ماوەی بەرهەمهێنان و بەسەرچوونی کراوە، ئێستا هەقی خۆتە هەموومان ڕاپێچی زیندانکەیت.. بەڵام ئەوە نەئیشی منەو نە ڕێگەش بە هیچ کەسێک ئەدەم لەبەردەستی منا ئەوە بکا.

ئاسایش: بەڵام لە کۆگاکانی تۆدان.

ڕێشار: بەڵێ بۆ فڕێدان دانراون و کابرا سەرقاڵ بووە.. خۆ لە سەلاجەیا دانەنرابوون (( دەست ئەداتە یەکێکیان)) ئەها چەند شل و خاوە؟.. یەکێ نیازی فرۆشتنی بێ، لێ ئەگەڕێ ئاوا بتوێنەوە؟

ئاسایش: ئەمە ڕاستە.. بەڵام ئەبێ بەڵێننامەیەکمان بدەیتێ کە بە هیچ جۆرێک هیچ شتێکی ماوە بەسەرچوو لە کۆگاتا گل نەدەیتەوە.

ڕێشار: ئەوە لە من ناوەشێتەوە قوربان گیان، هەرزار بەڵێننامەتان بۆ پڕ ئەکەمەوە، من شکۆو ئابڕووی خۆم چۆن ئەبەم بەو ئیشە مشەخۆریانەوە.. دوای ئەوە خێرەکەی چییە گەر ئەوەش بکەم؟ ئەم نیوەڕۆیە میوانی لای من ئەبن و ئەبینن چەند ئەوەندەی ئەوە خەرج ئەکرێ.

ئاسایش: نا سوپاست ئەکەین، نان ناخۆین، بەڵام تا ئەتوانی زووتر سەرێکمان بە لە دائیرە، بۆ پڕکردنەوەی بەڵێننامەکە.

ڕێشار: بەسەرچاوم جەنابت ئەمرەکەی.. هەر ئێستا لەگەڵ خۆتانا دێم، با زووتر بێ و منیش بگەڕێمەوە سەرئیشی خۆم.

Cut

دیمەنی – ٦٧ – ڕ- عەسر / د – گوند – ناودێی ماڵی باوکی خدر:

Mute

(( خدر بە جلی کوردی سپۆرتەوە لە سەیارەی دێ دائەبەزێت و هەندێ عەلاگەی بەدەستەوەو بەرەو ماڵی باوکی، خەڵکی دێ هەندێکیان ئەیبینن و سڵاوی گەرم و هەندێکیان باوەش پیاکردن و ماچ و مووچ))

Cut

دیمەنی – ٦٨ – ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( تیرۆژ زۆر گەرموگوڕ سەعی ئەکا.. نارەوەن تەلەفون ئەکا ))

نارەوەن: ئەی چی کچێ!! هەر گوێشی مەدەرێ با بۆ خۆیان هەر حەپەیان بێت، خەڵک تۆش ئەناسێ و ئەویش ئەناسێ.

دەنگی ژن: توخوا چیتری ئەوت؟!

نارەوەن: جا چی نا؟! بەعزێ قسەی هەر ڕووی وتنیم نییە، بەس توخوا وەک سوێندت بۆ خواردم، با هەر بەینی خۆمان بێ.

تیرۆژ: دایکە برسیمە.

نارەوەن (( تورە)): دە باشە نابێ ژنەکە تێگەیەنم گێلاس چۆن لە شوێنان باسی ئەکا؟!

تیرۆژ: جا ئەوە چ پەیوەندیی بەتۆوەیە دایە گیان؟ بۆ خۆت توشی سەرێشە ئەکەی؟

نارەوەن (( تووڕەبوونی سوعبەت)): دە تۆ دەمت داخە با ژنەکە تێگەیەنم... (( بۆ مۆبایلەکە)) ئیتر ئاوا ناسکە خان گیان..

دەنگ: دە یاخوا بتەقن، بەخوا سایە گیان شوویەکی کردووە، لە هەموو تایەفەکەی ئەوا، نە کوڕی ئاوا جوان و نە ئاوا دەوڵەمەندی تیا نییە، ئەوە داخی دڵییەتی!

نارەوەن: ئەی چییی...... (( ئەکرێ بە میوتی ))

Cut

دیمەنی – ٦٩ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار توورەو کرمانج بە پێوە وەستاوە))

کرمانج: گەورەم من پێم وابێ هەر بە گومان و لەسەر قسەوقسەڵۆک هاتبن، خۆت سەغڵەت مەکە، باوەڕت بێ بەڵگەیەکیان پێبووایە کەسمان بە ئاسانیی قوتار نەئەبووین.

ڕێشار: ئەی قسەوقسەڵۆک لە ڕێگەی کێوە دروست بووە، هەڵبەت کەسێک لە دەمی خۆمانی وەرگرتووە، یان ئەسسەح بینراوە.. من باوەڕم بەوە نییە زانیارییان لانەبێ، چونکە خۆمان نیازی ئەوەمان هەبوو.. باشە سەرزل وا بمانفرۆشتایەو پارەی بکردایە.. تۆ بۆ نەتخستبوونە بەرادەوە؟

کرمانج: گەورەم لە بەرادا بووایە ئێستا تیاچووبووین.. بەڵام ئێمە بڕیارمان وابوو فرێیان بدەین و من خەسارەبژێرەکە بم.

ڕێشار: وابوو.. دەی کەسیش نازانێ خێر بەچییەوەیە.. ئەوە لەو پارەیەش خۆش بووم کە ئەکەوێتە سەر تۆ، هەهە شەڕی لایەک بەخێری لایەکیترا شکایەوە.. گرنگ ئەوەیە باش شکایەوە.. ئەو دوو هەتیوە نەگەڕاونەتەوە؟

Cut

دیمەنی – ٧٠ – ش/ن – گوند – ماڵی باوکی خدر:

(( باوکی خدر تەمەن ٧٠ساڵێک، هەرمێی خوشکی جوان و سادەو سروشتیی، تەمەن نزیکەی ٢٧- ٣٠ ساڵێک، لەگەڵ خدر دانیشتوون))

باوک: کوڕم ئەو پارەیە زۆرە بۆ ئێمە، چی لێبکەین؟ ئەترسم خۆشت لێت ببڕێ!

خدر: نا باوە گیان ئیشم لە باشیایا.. باوەڕ ناکەی دەرفەتی نیو سەعات ئیسراحەتم نییە.

هەرمێ: یاخوا ئەو لەشەت ساغ بێ، جا تۆ ئاوا ماندوو بیت و ئێمە بیخۆین؟

خدر: هەرمێلە گیان، باوەڕ بکە زۆر زۆرم پێخۆشە ئاوا پڕ ئیشم، تۆ بڕۆ سەیری ئەو خەڵکەکە چاوەکەم، باوەڕت بێ خەڵکی وا ئەبینی بەدوای ئیشا ڕیاییت بۆ ئەکا، لە حاکمی وڵات ئەگەر زیاتر نەبێ و زاناتر نەبێ، هیچی وای لەو کەمتر نییە.. خەڵک ئەپاڕێتەوە بۆ پاروویەک نان خوشکەکەم، دوعا بکە هەروا ئیشم زۆر بێ.

باوک: وایە، من هەرچی ئەبینم باسی برسێتیی و نەبوونی ئەکا، زۆر لە خەمی تۆیا بووم تۆش وا بیت.

خدر: نەوەڵا باوەگیان، ئەم دوای نیوەڕۆیە یەک یەک بەسەریانا گەڕاوم و ئیزنی ئەم تاقەم لێ خواستوون.. بەیانی پێش ئەوان ئەبێ بگەمەوە سەرئیشەکەم.

باوک: دەی یاخوا هەر تۆ لەشت ساغ بێ و ئاوا پڕ ئیش بی من هیچم ناوێ.. جاروبارێکیش ئاوا دڵ و دەروونمان ڕۆشنکەرەوەو بتبینین.

خدر: ڕاستییەکەی لەمەودوا ڕەنگە نەمپەرژێ شەش مانگ جارەکەش سەرتان بدەمەوە، ئەبێ لە قسورم عەفوو بن باوە گیان.. شتێتریش هەیە کە سەرباری ئیشەکە ئەبێ بە دەمیەوە بچم، بۆیە باوەڕ ناکەم هیچ کاتم بۆ بهێڵێتەوە.

هەرمێ: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ بەخوا من بیرت ئەکەم، بە پێش بێ ڕێی شار ئەگرمە بەرو دێم بۆ لات.

خدر: نا نا.. قەت بیر لەوە نەکەیتەوە هەرمێلە گیان.. شار پڕ مەترسییە، ئامانی نییە، ئەو هەڵەیە نەکەی.

باوک: نا نا هەرمێ ئاقڵە، ئەوە بۆ ئەوە وا ئەڵێ تۆ ناچار بکا بێیتەوە.

خدر: دڵنیابە گوڵی کاکەی، هەر دەرفەتم بێ، لێرەم، خۆ منیش لێتان تەوەللا نیم.. بەڵام ئەڵێم نەک ئیشەکە وا چڕ ببێتەوە نەمپەرژێ.. هەموو مانگێکیش هەر وەک ئێستا، بە سەیارەی دێدا پارەکەتان بۆ ئەنێرمەوە.

هەرمێ(( عاجز)): نەفرەت لە پارە.. ئێمە خۆتمان ئەوێ، چی لە پارە بکەین.. ئەوەندەم کۆکردۆتەوە ئێستا گاڵتەم پێی دێت.

Cut

دیمەنی – ٧١ – ش/ن – ژورێکی لادێ:

(( سەرەو مالە بە دەموچاوی هەڵپێکراوەوە، بەدیار بروسکی تەمەن ٣٢- ٣٥ ساڵەوە وەستاون))

بروسک: ئەزانن بیر لەوە ئەکەمەوە ئێوە چەند باشن؟

سەرە: ماستاومان بۆ سارد مەکەرەوە خوێڕی، ئێمە تۆمان ڕفاندووە، ئیتر باشی چی؟

بروسک: با، باشن، باشیەکەشتان ئەوەیە ناتانەوێ بمرم.. ڕەنگە پارەی باشتان بە من دەستکەوێ، بۆیە باشیی ئەنوێنن.

مالە: چەنە چەن مەکەو قوزەڵقورتەکەت بخۆ، درەنگمانە، ئیشیترمان بەسەرا کەوتووە

بروسک: من چاوەڕێی دەستی ئێوەم بۆ پارووە نانێ، ئەزانن ئەمە لە هەژاریی و بێ پارەییش ناچێ؟ کە بێ پارە بی، پارە بۆ نان پەیا ئەکرێ.. بەڵام لەم ژوورەدا کە خوا و ئێوە نەبێ کەس نازانێ لە کوێیە، من تەنها چاوەڕێی دەستی ئێوەم.. ئەگەر نەیهێنن ئەمرم لە برسا.. ئێستا ئەزانن چەند باشن و بۆچی باشن؟

مالە: خۆی وایە ئێمە زۆر باشین، بەڵام ئێمەش ئەمرمان پێکراوە باش بین.

بروسک: ئەو خێرخوایە کێیە ئەو ئەمرەی پێکردوون؟ بیللاهی کە گەڕامەوە یەک دنیا دەعوەتی ئەکەم.

سەرە (( لەپشتەوە لەقەیەکی لێ ئەدا)): بێدەنگبەو ژەهرەکەت بخۆ.

(( بروسک بە دەما ئەکەوێت و بە بێدەنگیی لەفەکەی بەردەمی هەڵئەگرێ و ئەیخوا))

Cut

دیمەنی – ٧٢ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن سەرقاڵی مۆبایلە، زوبێر بە چاکەت و بیجامەوەو خاولی بەسەریەوە، ئاماژە بۆ خۆشتن، پاش کەمێک دێتە ژوورەوە.))

زوبێر: چی بوو کاردۆ وەڵامی نەدایتەوە چیمەن؟

چیمەن: با، ئەڵێ دوو کۆنتێنەرم بەڕێکردووە، ئەمڕۆو سبەیش لە کۆکردنەوەی کەرەستە ئەلکترۆنییەکان تەواو ئەبم، خۆم ئەچم بۆ ئۆکراین نایەمەوە.

زوبێر: زۆر باشە ئەو دڵەڕاوکێیەش نەما.. ئێستا هەر تۆ ماوی، نازانم چیت لێ بکەم؟

چیمەن: ببورە باوە گیان، بوومە مایەی سەرێشەی تۆ.. بەخوا گوناهی من نییە، خۆی هیچ لەبارا نەبووە.

زوبێر: ئاخر ئەوە گرفتی زوربەی خەڵکە هەر تۆ نیت! هەروەکو بڵێی لەم هەموو ناشرینییەی ئێرەدا، عەشق لەوپەڕی پیرۆزیدابێ.. بە ڕاستی من بەخیلیی بەو هەموو متمانەیەت ئەبەم کە بەو هەتیوەت کردووە.. ئاخر چۆن ئەکرێ، درک بەوە نەکەی ناشرینیی بە هەموو ژیانا ڕۆچووە؟ شتێک نەماوەتەوە دیوە ڕاستەقینەکەی خۆی دەربخا!! ئەها سەیری ئەو دوو کەنارییە بکە (( دوو کەناری لە قەفەزێکدان)) ئەوانیش لەوە گەیشتوون سروشتی ئێمە گۆڕاوە، وەک جاران متمانەیان بە ئێمە نەماوە.

چیمەن (( ئەگری)): باوکە تکایە بەس بمکوژە!! تکایە ئەگەر چارەسەریت لانییە با خۆم بکوژم و تەواو.

زوبێر(( پێکەنین)): هههە خۆکوشتن؟! بۆ؟! شتێک ڕوویداوە پێویست بە خۆکوشتن بکا؟

چیمەن: ئەی بڵێم چی؟ من بەرگەی ئەو هەموو ئازارە ناگرم و قسەو توانجی تۆش لەولاوە بوەستێ.. ئەزانی من بە تیلە چاوێکت چەندجار ئەمرم؟! جاران چاوی تۆ پەناگەم بوون، ئەوەندە میهرەبان بوون وامئەزانی قەڵای گەورەی منن.. کەچی .....

زوبێر (( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئێستاش هەروایە چیمەن گیان، هیچ نەگۆڕاوە.. ئەوەی دەری ئەبڕم بە سوکایەتی نەزانی، ئەوە بۆکرۆزی جەرگمە کچم، من لە تۆ زیاتر ئەو سوتانە ئەچێژم.. ئاخر چۆن باوەڕ بەوە بێنم کچەکەم لەوپەڕی چاوەڕوانی ئومێدو هیوایدا، زەبرێکی ئاوا کاریگەری بەرکەوێ.. ئەمڕۆ پێنج ڕۆژە وەک ئەڵێی ئەو هەتیوە خۆی گورگە کردووەو ....... (( زەنگی مۆبایل و وەڵامدانەوە)) بەڵێ...

دەنگ: ئەگەر بەدوای بروسکا ئەگەڕێی، با قسەیەکی تیا بکەین!

زوبێر(( شڵەژانی زۆر، چیمەن نزیک ئەبێتەوە لە مۆبایلەکە، کاتێ باوکی قسە ئەکا )): بروسک کێیە؟ من نایناسم!

دەنگ: ئاساییە، ڕاستە، ڕەنگە تۆ نەیناسیت، بەڵام چیمەن خانی کچت باشی ئەناسێت، کاتێکیتر قسە ئەکەینەوە.

زوبێر: ئەلوو .. ئەلوو... (( بۆ چیمەن)) ئەمە کێ بوو؟ ئادەی بزانم.. (( کەمێک سەرقاڵ ئەبێ بە مۆبایلەکەوە)) لە تروکەڵەریش ناوی نییە... باسی بروسکی کرد.

چیمەن (( زۆر شڵەژاو)): تۆ بڵێی شتێکیان لێ نەکردبێ باوە؟

Cut

دیمەنی – ٧٣ – ڕ- پێش دەوام/ د – بەردەم نەخۆشخانە:

(( سەلواو ڕێژوان ئاشنایەتیی و نزیکییان پێوە دیارە))

سەلوا: ئەی خۆ کە ئەمشەو بە تێل پێم وتی ڕەنگە بیگوێزنەوە بۆ نەخۆشخانەی گشتیی، لە خۆمەوە نەموت!!

ڕێژوان: کچێ تۆ وریای (( بە شەرمێکەوە)) دیارە هەموو شتێک زوو تێئەگەی!

سەلوا(( سەردائەخات و تیلە چاو ئەکا، بە عیشوەوە)): ڕەنگە وابێ، (( ئاسایی ئەبێتەوە سەیری ئەکا)) پێت سەیر نەبێ کچان زۆر زووتر لە کوڕان درک بە شتەکان ئەکەن.

ڕێژوان: ئەمڕۆ کاکیشت دێتەوە، بەو هیوایەی کە لێی پرسیت، بە باش باسمان بکەیت.

سەلوا: ئەوەیان خۆت ئەیزانیت.. ئەوەندەت نەکردووە بتوانم لە باشەت کەمتر بڵێم.

ڕێژوان: ڕۆشتنی کاک هەندرێن، دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ من، کە تۆم تیا ناسی.

سەلوا (( کەمێک شڵەژان)): هەروەها بۆ منیش.. (( ئاسایی بوونەوە)) دەبا بچین باوکم بگوێزینەوە.

ڕێژوان: سەرچاو فەرموو.

سەلوا (( یەک دوو هەنگاو ئەڕۆن)): ئەرێ تۆ وتت خوشکەکەت ناوی چیمەنە؟ شووی کردووە؟

ڕێژوان: نا ئەو لەگەڵ باوکم و کاردۆی برام پێکەوە ئەژین.

سەلوا: ئەی تۆ؟

ڕێژوان: من و دایکیشم بە جیا ئەژین.

سەلوا: بۆ؟ دایک و باوکت جیابوونەتەوە؟

ڕێژوان: ئیتر ئەوەیان پێ باشتر بوو... ________ Cut ________

دیمەنی – ٧٤ – ڕ/ ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج و سەرەو مالەو ٢ گەنجیترو بێستان و تافان دانیشتوون))

ڕێشار (( بە فەوقیی قسە کردن)): ئێوە ئەو ئیشەی بۆتان دیاریکراوە، هەر ئەوە ئەکەن و ئەگەر شتێک لە دەرەوەی ئیشی خۆتان بوو لێرە مەیکەن.. نهێنیی ئێرە پارێزراو ئەبێت، کەس لێتان ناپرسێتەوە.. کە نهێنیی ئێرە لە دەرەوە، تەنانەت لای نزیکترین کەسی خۆشتان بدرکێنن، بەڵکو سزاکە جێبەجێ ئەکرێت و سزای ئێمەش هیچ دەرفەتێک بۆ ژیان ناهێڵێتەوە.. هیچ کەسێک بۆی نییە بچوکترین قسەی بەرزو نزمتان لەگەڵ بکا، کە نیگەرانتان بکا، هەرکەسێک وەڕسی کردن، بە خۆم بڵێن، بە بەرچاوی خۆتانەوە زمانی ئەبڕم و ئەیخەمەوە ناو دەمی.. ئەمە مەرجەکانی ئیشکردنەو هیچیتر.. ڕازین؟

بێستان: داوایەکم هەیە ژووری تایبەتی خۆمان هەبێت.

ڕێشار: هەروا ئەبێ، کرمانج ژووری بۆ ئامادە کردوون.

تافان: ئەی موچەکەمان چەند ئەبێ؟

ڕێشار: خەمی موچەتان نەبێ، بە دڵی خۆتان ئەبێت.

بێستان: یەعنی کاری من ژمێریارییەو ئیتر دەست بۆ ڕەش و سپیی نابەم؟!

ڕێشار: بە دڵنیاییی.

بێستان: کەوابێ، من ڕازیم و سوپاس بۆ ئەو دەرفەتەی جێی منتان کردەوە لێرە.

تافان: منیش ڕازیم.

ڕێشار: کەواتە بەخێربێن بان دیەم، ئێوە خوشک و دادەی منن لێرە.

کرمانج: هەروەها خوشکی بەڕێزی ئێمەش.. بەو هیوایەم زۆرترین کات پێکەوە بین و هەروەک ئەوەی یەک خێزان بین.

Cut

دیمەنی – ٧٥ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێر بێتاقەت و ماندووە، خەیاڵی ئەڕوا لە کاتی قسەکردندا.. دارەوان دیقەتی ئەداتێ و بۆی بە پەرۆشە))

دارەوان: هیچ لای من نیت زوبێر! (( وریای ئەکاتەوە)) زوبێر، حەمە زوبێر!

زوبێر: ببورە دارەوان.. کەمێک خەیاڵم ڕۆشتبوو..

دارەوان: هەندرێن گەیشتۆتە ناوشارو خەریکی داگرتنی بارەکانن..

زوبێر: ئەگەر بکرێ دارەوان گیان خۆت سەرپەرشتی بکە، ببورە من کەمێک نەساغم!

دارەوان: ئەگەر کێشەیەکت هەیە؟ خۆ لە من نزیکترت نییە، با بیزانم.

زوبێر: ڕاستیەکەی مێشکم جام بووە دارەوان، شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام ئیتر وا سەرقاڵی کردووم.

دارەوان: ئەگەر ناوترێ ئاساییە.. بۆ ناچی لەماڵەوە پشوویەک بدەی.. ئەوە وەزع نییە تۆی تیای.

زوبێر: پەیوەندیی بە شوێنەوە نییە، لە هەر جێگەیەک بم وەک یەک وایە، هەر ناتوانم بیربکەمەوەو هیچیتر.

دارەوان: ناااا.... کەواتە کێشەیەکی گەورەیە گەر وابێ... ئۆو چاویشت سوور بووە.

زوبێر: هیچ نییە کەمخەوییە!

دارەوان: جا ئەگەر ئاساییە، منیش بەشدار بکە لە کێشەکەتا، ڕەنگە شتێکم پێ بکرێ!

زوبیر(( هەڵئەسێ)): وابزانم بچمەماڵەوە باشترە.. (( بێتاقەت خەندە ئەکا)) زۆر ئەپرسی. (( بەرەو دەرەوە ئەچێ))

دارەوان (( دەست ئەخاتە ژێر چەنەی، کە هەر بە پێوە وەستاوە.. وەک ئەوەی خۆشحاڵییەکی کەم دەرببڕێ)): باشە خوات لەگەڵ با بێزارت نەکەم. (( دوای ڕۆشتنی

زوبێر، دارەوان تەلەفون بۆ هەندرێن ئەكا، لێرەوە ڕوخساری تورە نیشان ئەدرێ))... ها هەندرێن.. وەرەوە بۆ ئێرە.

هەندرێن (( دەنگ)): ئاخر قوربان هێشتا دەستنەکراوە بە داگرتنی بارەکان.

دارەوان: ئەوە پەیوەندیی بە تۆوە نییە، بڕیارم ناردووە ئەو سەرپەرشتی بکا.

هەندرێن: باشە بەسەرچاو گەورەم، هەرچەند کاک زوبێر وتی......

دارەوان (( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): قسەی زیاد مەکە.. بە پەلە وەرەوەو ببڕێتەوە.

هەندرێن: بەسەرچاو گەورەم.

(( دارەوان تەلەفون دائەخات و لە میوتیدا بە تورەیی ڕوخسارەوە تێلێکیتر ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٧٦ – ڕ/ د – ناو تەکسیەک:

(( هەندرێن نەفەرە، تێل ئەکا ))

هەندرێن: بەڵێ گەورەم، ئیشەڵڵا درۆت لەگەڵ ناکەم، خۆی وتی بگەڕێوە.

زوبێر: باشە کاکە، ئێستا ئەو لەوێیە، هەرچییەک ئەڵێ بە قسەی بکە، دیارە ئەوەی چارەسەر کردووەو ئەیەوێ تۆش تۆزێ پشوو بدەی.

هەندرێن: باشە بەسەرچاو گەورەم، بەس تکایە پێی نەڵێی جەنابتم ئاگادار کردۆتەوە.

زوبێر: نا باوکەکەم، خەمت نەبێ.. تۆش باسی مەکە.

(( تەلەفونەکەی هەڵئەگرێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ٧٧ – ڕ/ د – بەردەمی دوکانی ئامۆ:

(( خدر بارێکی کارەبایی لەبەردەم ئاوا ڕائەگرێ.. ))

ئاوا: ئەوە چییە حەمەخدر؟ بەم سەرمایە ئارەقەت لەبەر ئەچۆڕێ؟!

خدر: هیچ نییە کاک ئاوا، کە گەورە بووم بیرم ئەچێتەوە هههە. لە کوێ دایگرم برا؟

ئاوا(( بۆ ئامۆ لە ژوورەوە)): لەتشەکان هاتووە، ئاگایەکت لێرە بێ، ئەیبەم بۆ مەخزەن.

ئامۆ: باشە ئاوا گیان. بڕۆ.

ئاوا: هەر ئەیبەین بۆ مەخزەنەکە، با یارمەتیەکیشت بەم، خۆ کفر نابێ هههە زۆر ماندووی.

خدر: نا بەساقەوبم تۆ ئەرک مەکێشە، حەز ئەکەی هەر کلیلەکانم بدەرێ، خۆم ئەیبەم.

ئاوا: نا نا شتی وا نییە، خۆشم دێم. (( پێشی ئەکەوێ و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٧٨ – ڕ/ د – چایخانەیەک:

(( هەڵشۆو نیزام پیاوێکی تەمەن ٥٠ ساڵ دانیشتوون، چایان لە بەردەمایە.. شەنیای تەمەن نزیکەی ٣٠- ٣٢ ساڵ، لێیان نزیک ئەبێتەوە))

هەڵشۆ: ئەگەر ئەمە بێ عەننابییە!

نیزام: بێ ئەقڵ ئەوە کچەکەمە.

نیزام: بۆ ئەگەر کچت بێ نابێ عەننابی بێ؟ خوا نەیبڕێ و بۆ یەک هەر بمێنن.

شەنیا(( لامبالی)): چۆنن؟

هەڵشۆ (( لەبەری هەڵئەسێ)): سەرچاو سەرچاو بەخێر بێی یاخوا.

شەنیا: دانیشە خۆت سەغڵەت مەکە.. باوکە کوا؟

نیزام(( دەست ئەکا بە گیرفانیا پارەیەک دەردێنێ و ئەیداتێ)): یەعنی ئەگەر ئەم دیارییە نەبەی لەگەڵ دەستتا نابێ؟

شەنیا: نەوەڵا.. خۆ حەیای خۆم نابەم.

هەڵشۆ: دیاریی بۆ چ شوێنێک.

نیزام: نازانم بۆ ماڵی هاوڕێی ئەچێ، ئەبێ هەموو جارێک کۆڵێ پارە بە من ڕەقکاتەوە.

شەنیا(( بە گاڵتەپێکردن و لچ هەڵقورتاندنەوە، ئەیخاتە جانتا بچوکەکەی دەستییەوە)): دە ئەڵێم نەک پێت ناخۆش بێ با بتدەمەوە.

هەڵشۆ(( پێکەنین)): عەنابییە! بەدڵم بوو.

شەنیا: چیت بەدڵ بوو؟ باوکی خۆمەو گاڵتەی لەگەڵ ئەکەم پەیوەندیی چییە بە تۆوە، ئەڵێی ئیمۆجیی تووڕەبوونەکەی. (( ئەڕوا))

هەڵشۆ: ئەو ئیمۆجییەشم بەدڵ بوو هاهاها (( نیزام پێی ناخۆش بوو)) ــــ Cut ـــــــ

دیمەنی – ٧٩ – ڕ/ د – باخێکی گەڕەک:

(( حەمە تایەر پیکابە دەبڵەکەی لە سەر شۆستەی باخەکە ڕاگرتووەو لە نزیکیەوە لەگەڵ شەماڵ و ئاکار وەستاون))

تایەر: هەر گڕی تێبەرداوم گڕ.

شەماڵ: ئەگەر ئەزانی بۆت کۆنترۆڵ ناکرێ، با ئەگرکوژێنەوە بانگکەین.

تایەر بە باوکی ئاگرکوژێنەوەش ناکوژێتەوە.. ئاخر ناهەقت ناگرم، بەرەڵا نەتبینیوە، بە ئارەزووی خۆت ڕابوێرە.

شەماڵ: کورە پێشتریش دووان سیانێکت نیشانداوم، نە پارووی تۆن و نەجوانیشن، قورئان بە هەقت ئاکار، ڕێک لە چەقەڵ ئەچوون.. هەرئەوەبوو کەمێ دەستیان بەخۆیانا هێنابوو.

تایەر: شەماڵ بیبڕەوە، خەریکی لە ئاستی خۆت زیاتر پێ هەڵئەبڕی.

ئاکار: حەمە تایەر تۆ پێم بڵێ، سپییە یان گەنم ڕەنگ؟

تایەر: وەڵا لەبەر جوانییەکەی دیقەتی ئەوەم نەداوە.

ئاکار: باڵا بەرزە یان کوڵ؟

تایەر: خراپ نییە، نە بەرزەو نە کوڵ.

ئاکار: ئەی قژی، کورتە؟ درێژە؟ زەردە؟ ڕەشە؟ چی؟

تایەر: بەخوا وەک پێموتی، لەبەر جوانییەکەی نەمپەرژاوەتە سەر دیقەتدان.

شەماڵ: با خۆمان بچین جارێک ببینین، ئەوسا هەموو مواسەفاتی بە حەمەتایەر ئەڵێینەوە.. خۆ هەرهیچی نەزانی (( لاسایی کردنەوە، بە دەم)) وەڵا لەبەر جوانییەکەی دیکەتم نەیاوە. هەهە عەمرت نەمێنێ یاخوا.

ئاكار: هەتیو ئیتر عەشق وایە، كە عاشقی یەكێ بووی ئیتر لەشولاریت لا مەبەست نابێ!

شەماڵ: وەی قسەی قۆڕ.. وەڵا من كە عاشقی یەكێ ئەبم، لە نوكی پەنجەی پێیەوە تا تەوقە سەری لەبەر ئەكەم.. ئەی نابێ بزانم باڵا بەرزە؟ چاو شینە یا ڕەش؟ سنگ و گەردنی بەرزە یان قوپاوە؟  دەم و لێوی وەک گوڵی بەربەیانییە یان لە جێ مۆمی كوژاوەی شەو ئەچێ؟ ئینجا ........

ئاكار(( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئەوە تۆ وای نەک حەمەتایەر.

تایەر: وەڵا هەرچییەكی وت من بەس ئەوەم مەبەست نییە، یاڵڵای ئەكرد، شەل و كوێرو گۆج و كرماوی و سەقەت ئەبوو.. ئیشم بەوانە نییە، من عاشقی بووم و تەواو.

شەماڵ: ئەم قسانە بۆ من مەكە، خۆ حەزت لە من نەكردووە تا هەڵمخەڵەتێنی، بچۆ بە خۆی بڵێ.

ئاكار: وتت لە زانكۆیە؟

شەماڵ: هههە لە زانكۆیەو حەمە تایەر بە نیازی هێنانیەتی؟ (( سەر ئەباتە لای حمەتایەرەوە)) عەک طرحێو كاک حەمە تایەر.

تایەر(( هەڵئەسێت)): جارێ با من برۆم.. وەختی هاتنەوەیەتی. (( ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٨٠ –ڕ /ن –چایخانەکە:

(( هاوڕێ قۆری و پیاڵە ئەشوات و خدر دێت))

خدر: ئەوە چی ئەکەی؟

هاوڕێ: ئیتر وا بەرەبەرە کۆیان ئەکەمەوە، درەنگ بووە.

خدر: ئا تۆ ئەگەر تیا ماوە چایەکم بدەرێ.

هاوڕێ: بەشی تۆی تیا ماوە حەمەخدر، ئەمزانی دێیتەوە.

خدر: باوکی خۆم ڕۆ نەبێ ئەمڕۆ هەر کوشتیانم.. ئیشی دوێنێشیان خستبووە ئەمڕۆ بۆ من.

هاوڕێ: گوێم لێبوو دوێنێ یەک دوویەکیان ئەیانووت پەلەمان نییە، با بەیانی حەمەخدر بێتەوە هەە، کەس متمانەی بە ئەردەڵان و ئەحەو کارە نەماوە.

خدر: دەی خۆ بەردەوام دەنوکم لەسەریانەو ئەڵێم ئەوەندە گیانی خۆتان خۆش نەوێ.

هاوڕێ(( چاکەی بۆ دائەنێ)): بەخوا حەمەخدر گیان ئینسان خۆی کەوتووە، هەیە وایەو هەیە بە جۆرێکیتر، لەگەڵیان نەڵێی باشترە.

خدر(( پاڵ ئەداتەوە)): کەس نازانێ بەرەو کوێ ئەگوزەرێنین و چی دێتە ڕێگەمان.. ئۆو ڕەنگە ئەمڕۆ لێرەو پاش ماوەیەکیتر لە جێگەیەکیتر بین.

هاوڕێ: وا جارێ باش ئەگوزەرێ و بۆ هەر شوێنێکیش مل بنێین لەگەڵی ڕایەین بەقوربان، خەفەتی لێ مەخۆ.

محە ناشوکر (( هاتۆتە ناو دەرگاکە)): خەفەتی چی لێ ئەخۆی خدرۆکە؟

خدر: نا.. باسی قسە ئەکەین مامە محە.

محە: چایەکی تاڵم بدەرێ هاوڕێ، بەڵام با گەرم بێ.

هاوڕێ: با بزانم تیا ماوە؟!

محە: خدرۆکە گیان تۆ پیاوێکی ئاقڵی.. من لە ژیانما تووشم بووە بە زۆر کەسەوە.. ئەوانەی لە ڕەنگ و بۆ و ڕەفتاری تۆیا بوون، هەموو فڕیون ئێستا.. ئەگەر منیش نەمام، ئەم قسەیەی مامە محەی خۆت لە بیر بمێنێ.. تۆ باش پێ ئەگەی.

خدر: هههە مامە محە بەشی ئێمە هەر حەماڵیی و کرێکارەیە، پێگەیشتنی چی چاوەکەم.. نە بڕوانامەیەکمان هەیەو نە کەسێک دەست بە پشتمانا ئەداو نەخزمی کەسێکی دەستڕۆشتوو بووین وەک ئەو خەڵکە.. ئیتر بەچی پێ بگەم؟

محە: تواناو هەستکردنت و پابەند بوونت بە ئیشەوە، لە سەد کەسی سەگباب باشترە پشتت بگرن.. پشت کە ئیشی پێت نەما، ئیتر نەیناسیوی، بەڵام تواناکەت بەردەوام وا لەگەڵتا.. دڵ لەدڵ مەدە خدرۆکە گیان، پارە پەیاکردن بڕوانامەشی ناوێ، سەدساڵی پێش ئێستە بهێنەرە بەرچاوی خۆت، نەک بڕوانامە، هەر خوێنەوارایش کەم بووە لەم شارەدا.. مل بدەرە بەر ئیشەکەوت ئاوڕ لە کەس مەدەرەوە.

Cut

دیمەنی – ٨١ – ش/ن –ماڵی نارەوەن:

(( دەرگا ئەکرێتەوەو دارەوان دێتە ژوورەوە.. تیرۆژ زۆر بە گەرمیی و خۆشییەوە بەخێرهاتنەوەی ئەکا، نارەوەنیش پێی سەیر ئەبێ))

تیرۆژ: ئاڵڵااااا باوکم زوو هاتەوە!

نارەوەن: خێر وا زوو هاتیەوە، ئەڵێی دەرگای کۆمپانیایان لەسەر داخستووی؟

دارەوان: نا. نە دەرگایان لەسەر داخستووم و نە هیچ شتێک.. حەزمکرد لە ماڵەوە خۆم بشۆم، نانێکیش بە یەکەوە بخۆین و شەوێکی خۆش پێکەوە بەسەر ببەین.

نارەوەن: وی بیسمیلا! چۆن بوو ئەمە هات بە خەیاڵتا؟

دارەوان: ئیتر جاروباریش جەو گۆڕین خراپ نییە.

نارەوەن: ئا باش بوو پیاوەکە باسی جەو گۆڕینت کرد.

دارەوان: فەرموو ئەمرکە.

نارەوەن: خۆت ئەزانی دارەوان گیان ماڵ هەمووی هەر ئەرک و ئازارە.. باوکیشم خوا عافویکاو جێگەی بەهەشت بێ ئیشەڵڵا چۆتە جێگەی حەقی خۆی.. باوەڕ ناکەم لە ژیانا بمایە، قەت ئەم وەزعەی ئێستا منی تیام قبوڵی بکردایە.

دارەوان: خوا عافویکاو تێت ئەگەم بە قوربان، باوەڕ بکە بە چەند کەسم وتوە بۆ ئیش و سۆراخی دنیاشم بۆ کردووی، هیچ نییە، ئیش قاتیی بووە.

نارەوەن: ئەی ئەگەر خۆم ئیشێکم دۆزیبێتەوە؟

دارەوان: دەی با بزانین ئیشەکە چییەو چۆنەو لە کوێیە؟ خۆ هەموو ئیشێک لایەقی نارەوەنە گوڵەکەی خۆم نییە!

نارەوەن: یاسایی؟ ڕێک ئەوەی کە خوێندوومە.

دارەوان: جا هیچت بیر ماوە؟

نارەوەن: ئەی وەڵا خۆ ئیتر ئەبێ لە سفرەوە دەست پێ بکەمەوە.

دارەوان: ئەتوانین کەسێکیشت بۆ بگرین ئەوەی پێویستە بیرت بخاتەوە، ئەوە نابێ بە کێشە.. ئیشەکە حکومییە؟

نارەوەن: نە نە لە کۆمپانیاکەی نزیکی خۆتانە، ئەوی کابرا، ڕێشارەکە.

دارەوان(( سڵەمینەوەو هێمن)): یەعنی نارەوەنی من بچێت لای ڕێشار ئیش بکا؟

نارەوەن: بۆچی؟ ئیش عەیبەی تیایە؟

دارەوان: نا هیچ عەیب نییە.. بەڵام تۆ ئەزانی من لەم سەر گۆی زەویەدا چاوم بەیەک کەسا هەڵنایا کە ئەویش ڕێشارە؟

نارەوەن: نا نا ئەوەم نەزانیوە.

دارەوان: هەر ئەوەش نا.. ئەویش بە چاوی دوژمنی خۆی تێم ئەڕوانێ.

نارەوەن: دەی کەواتە وا بزانە هەر نەتبیستووە.

دارەوان: نا چۆن وا دابنێم نەمبیستبێ؟ ئەوان ۆیان خەڵک ئاگادار ئەکەنەوە بۆ ئیش، کامیان هات بۆ لات؟ با بزانم.

نارەوەن: وەڵا کەس نەهات بۆلام.. لە دەمی تریفەم بیست، کە کچە جوانەکەی هاوڕێی خۆی لای ئەوان دامەزراندووە.. ئیتر بۆم مەکە بە قسە، کەس نەهاتووە بۆلام.

دارەوان: پەلە مەکە نارەوەن گیان، خۆم ئیشێکی زۆر ماقووڵ و باشت بۆ ئەدۆزمەوە.. سوپاس کە ڕاستەوخۆ ئیشەکەشت ڕەتکردەوە.. ئەوە نیشانەی سەرەکیی ژنی باشە، بەبێ قڕە کۆتایی بە کێشەیەک هێنا.

تیرۆژ: ئەی چۆن دایکی من هەروایە.

نارەوەن: سوپاس بۆ تۆش کە دەستی دەستیم پێ ئەکەی بۆ ئیش!

Cut

دیمەنی – ٨٢ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

(( تیرۆژ چاوەڕێی ئاوای برای ئەکا، سەیارەکە بهێنێتە دەرەوە.. ئامۆش دێتە دەرەوەو خەریکی ڕێکخستنی جلەکانییەتی.. سەیارەکەی تایەر بەوێدا دێت، تایەر تەماشای تیرۆژ ئەکا خۆشحاڵ ئەبێ، لەو کاتەشدا ئاوا سەیارەکە دەرئەکا ))

ئامۆ (( بۆ تایەر، بە توانجەوە )): وریابە خۆت نەدەی بە شتێکا کورە!

تایەر (( تەماشای ئەکاو ڕائەوەستێ )): ئەوە لەگەڵ منت بوو برا؟! بەڵێ ئاگام لە خۆمە.

ئامۆ (( گرژ )): کێ لەگەڵ تۆیەتی؟ لەگەڵ براکەمم بوو سەیارە دەرئەکا.

تایەر: باشە سوپاس، وامزانی لەگەڵ منت بوو! (( تیرۆژ ڕووی لێوەرئەگێڕێ ))

ئامۆ: فەرموو بڕۆ، ڕێت گرتووە.

تایەر: ئەوەندە توڕە مەبە برا، ئەی هەر ئەبێ بڕۆم.

ئامۆ(( توڕە )): ئەرێ دەبڕۆ کاکە دەبڕۆ (( بە دەنگی نزمتر )) ئای خوایە ئەمە چییە بەم سبایساڵحانە توشمان بوو؟

(( تایەر ئەڕوات و ئەوانیش سواری سەیارەکەی ئاوا ئەبن ))

———————————— Cut ————————————

دیمەنی – ٨٣ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( حەمە خدر دێتە ژوورەوە، فم ئەکاو ئاوی لووت هەڵئەلوشێ، زۆپایەکی غازی پێیە، لەبەر دەرگاکە دایئەنێت و بە ماندوێتییەوە دێتە لای هاوڕێ))

خدر: شفتەیەکم  بۆ بکە بە بابۆڵە، مام هاوڕێ.. ئیشی ماڵانم هەیە.

هاوڕێ: سەرچاوم، ماندوو نەبی.

خدر: کورە ماندووی چی خەریکە ئەتۆپم، جا ئەم هەڵامەتەشم گرتووە.

هاوڕێ: گوێ مەدەرێ حەمە خدر گیان، نان پەیاکردن ئاسان نییە.. خۆتۆ جەماعەت نیت بە تەلەفونێک قاسەت پڕ بکرێ.. تا ئەمرین من و تۆ ئەوە حاڵمانە. بەخوا قەت ناحەسێینەوە.

خدر: دە توخوا تۆش برینم تازە مەکەرەوە، خۆم ئەیزانم.. ئەڵێم، هاوڕێ گیان.

هاوڕێ: جارێ بگرە ئەوە لەفەکەت و ئینجا بڵێ.

خدر: ئەو بارە گەورەیە چییە ئەڵێن هەندرێن هێناویەتی و ئێمەشیان نەبرد بۆ داگرتنی.

هاوڕێ: چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئەی هەموو جارێ ئێوە نابەن بۆ داگرتن؟

خدر: ئەمجارە ئێمەیان نەبرد، لەوە تێنەگەیشتم بۆ؟

هاوڕێ: وەڵا سەیرە.. بەس لە هەندرێن ئەپرسم کە دەرکەوتەوە، بزانم بۆ ئەیدەن بە حەماڵی ئەملاولا.. نا نا هیچ خەمت نەبێ.

خدر: کورە خەمی چیم نەبێ، تازە ڕەنگە داگیرابێ و باریش کرابێتەوە.

هاوڕێ: دەی گوێ مەدەرێ، بە قسمەت نەبووە.

خدر: ناوەڵا هیچ گوێی نادەمێ لە خوا بەزیاد بێ، دانەنیشتووین.. بەس وتم داخۆ چی بێ. (( خدر زەنگی بۆ دێت و وەڵام)) ئەلو شوکور باشیت نارەوەن خان...... بەڵێ بەڵێ

لە بیرمە بەسەرچاو، چۆن لە ئیشی تۆ غافڵ ئەبم...... بەڵێنەکەمان دوای نانی نیوەڕۆیە، من سەعات یەکونیوی ڕێک لە خزمەتدا ئەبم....... سوپاس بیرت خستمەوە، خۆشم لە بیرم بوو...... نا نا دڵنیابە لەوێ ئەبم...... بەسەرچاو ئەمرەکەی..... خوا ئاگای لێت بێ.

(( مۆبایل دائەخاتەوەو هەڵیئەگرێتەوە))

هاوڕێ: ئەڵێی ئیشیماڵەوەش بە تۆ ئەکەن؟

خدر: لێی مەڵێ، نیعمەتەو خوا ناردویێتی.

(( خدر لەفەکەی ئەخوا))

Cut

دیمەنی – ٨٤ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار- ژووری کچەکان:

(( بێستان و تافان دانیشتوون، یاری مۆبایل ئەکەن.. پاش کەمێک ڕێشار دێتە ژوورەوە))

ڕێشار: خوشکە گوڵەکانم هیچیان پێویست نییە؟

(( تافان و بێستان لەبەری هەڵئەسن و بەیانی باش و وەڵامدانەوە))

تافان: ئەگەر زەحمەت نەبێ، کارتی تەلەفونتان لایە.

بێستان: سوپاس کاکە ڕێشار، مەبەستی ئەوەیە هەموو شتێکمان هەیە لەسای سەری تۆوە، تەنها لەوەمان کەمە، بە گاڵتەوە وتی.

تافان: نەوەڵا بێستان گیان بەڕاستمە بیرم نەبوو بیکرم.

ڕێشار: وازی لێ بێنە بێستان خان تەریقی مەکەرەوە، ڕاست ئەکا، من وتم هەرچییەکتان پێویست بوو بە خۆم بڵێن.. لامە لە ژوورەکەی خۆمە، بەسەرچاو، هەرکاتێ هاتی لە خزمەتتایە.

تافان: ماڵت ئاوا بێ زۆر سوپاس.

ڕێشار: تۆزێکیتر زۆپا غازەکەشتان بۆ دێت، بێخەم بن.. هەر ئەمرێکیترتان هەبێ.

بێستان: زۆر سوپاس کاکە ڕێشار.. هەر خۆشی تۆ.. هەموو شتێکمان هەیە.

(( چوونە دەرەوەی ڕێشارو گرژ بوونی بێستان))

بێستان: بەڕاستی ئەگەر داوای شتی تریان لێ بکەی، من ناتوانم لەگەڵتا دەوام بکەم و وازی لێ ئەهێنم.

تافان: ئەوە بۆ وا بە گومانەوە سەیریان ئەکەیت، پیاوی زۆر باشن وەک برامان وان.

بێستان: ناهەقت ناگرم، بەسادەیی خۆت ئەڕوانی، بەڵام هەر ئەو سادەییەیە سەری زۆر کەسی داوە بە فەتارەتا.. نابێ وا بیت تافان، پێمخۆش نییە.

تافان(( هەڵئەسێ)): با من جارێ بچم کارتەکە بێنم، دوایی قسە ئەکەینەوە.

(( بێستان سەربائەدات و گرژتر))

Cut

دیمەنی – ٨٥ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و کڵپەی ١٣ ساڵ و باڵای ٨- ٩ ساڵی لە باوەش گرتووە))

باڵا: هەر ناهێڵێ بچینەوە بۆ مەکتەب، ئێستا یەک دنیا شتمان خوێندوە.

هەندرێن: نا باڵا گوڵ جارێ کاتی مەکتەب نەهاتووە، ئێستا خۆتان بگۆڕن و جلی مەکتەب لەبەرکەن، ئەچین لە دەریشەوە نان ئەخۆین و خۆشم تا لای ماموستاکانتان دێم و مۆڵەتی دوێنێشتان بۆ وەرئەگرم.

(( هەردووکیان لە خۆشیا ماچی ئەکەن، بژی باوکم بژی باوکم))

هەندرێن: ئەی دوێنێ سەعات چەند هاتەوە کڵپە گیان؟

کڵپە: سەعات دوو و نیو.

باڵا: وەڵا خەریک بوو ئەبوو بە ئێوارە.

هەندرێن: دەی خێرا دەستوبرد کەن، با لە مەکتەب دوا نەکەون.

هەردووکیان: بەڵێ باش.

(( هەندرێن تەلەفون بۆ تافان ئەکا، داخراوە.. منال خۆیان ئەگۆڕن و ئامادە ئەبن))

تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٨٦ – متبوع – ڕ / د – شەقامی ناوشار:

Mute

(( هەندرێن و کڵپەو باڵا، لە قرطاسییەیەک دێنە دەرەوەو هەندێ پێداویستیی قوتابخانەیان کڕیوەو دڵخۆشن.. دواتر خۆیان ئەکەن بە دوکانێکی فاست فوداو لەسەر مێز دائەنیشن))

Cut

دیمەنی – ٨٧ – ڕ/ن - ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن جلی شتن جیا ئەکاتەوە، گیرفانی جلەکان ئەگەڕێ و ئەیخاتە غەسالەوە.. لە چاکەتێکی دارەواندا، لە گیرفانی ناوەوە کلیلی دەرگایەکی کۆن ئەبینێتەوە، کە وەک دەرگای نوێ نییە، پێی سەیر ئەبێ ))

نارەوەن: ئەمە چییە؟ نە لە ماڵ و نە لە کۆمپانیا کلیلی وا بەکار نایەت.. (( پێکەنینێک بە ترسەوە )) تۆ بڵێی ماڵێکیتری هەبێت؟ قەت خوا ئەوەی پێ نەکردبی دارەوان ئەفەنی ژنت بەسەرا هێنابم..

# (( ئەڵقەی پێنج ))

هههە نا نا، ئەوە چییە خۆم ئەترسێنم؟ کێ ئەڵێ هی مەخزەنێکی، هی شوێنێکیتری نییە، داماوە خۆ هەموو شەوێ لە ماڵەوەیە.. خوا خوایەتی من بەزمی پێ نەگێڕم، هیچ ناکا ژن ئەهێنێ؟!!! خۆی باشم ئەناسێ.. دەی کە هاتەوە پێی ئەڵێم کلیلی کوێیەو بڕایەوە.. (( کەمێک بیرکردنەوە )) نا.. ئەو چاکەت و پانتۆڵەی ناشۆم و وەک خۆی هەڵی ئەگرمەوە.. بزانم چەند بە پەرۆش ئەبێ بۆ کلیلەکە، ئا ئا چاودێری ئەکەم و خۆ شتێک هەر تێ ئەگەم.

(( کلیلەکە ئەخاتەوە گیرفانی چاکەتەکەو لەگەڵ پانتۆڵەکەی دەری ئەهێنێ لە غەسالەو ئەیبا بەرەو ژووری نوستن، یان هۆڵ، هەڵی ئەواسێتەوە.. پاش کەمێک لە جەڕەس ئەدرێت، بۆ دەرگای دەرەوە ئەچێت ))

تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٨٨ – متبوع - ڕ/ د- حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن کە دەرگا ئەکاتەوە، حەمە خدرە.. پاش سڵاو))

نارەوەن: خێر حەمە خدر؟! بۆ وا زوو هاتی؟

خدر: وەڵا نارەوەن خان کاک دارەوان ناردمی بۆ کلیلی مەخزەنەکە، وتی لە گیرفانی چاکەتە ڕەشەکەیدایە، کە هەر بە جەنابت بڵێم خۆت ئەیزانی.

نارەوەن: ئا ئا بوەستە یەک دەقە، ئێستا ئەیهێنم.

(( تا نارەوەن ئەگەڕێتەوە، خدر تەماشای باخەکەی ئەکات.. نارەوەن دێتەوەو کلیلەکەی ئەداتێ))

نارەوەن (( بە پێکەنینەوە)): فەرموو ئەوەش کلیلەکەی.. ئەی جەناب کەی دێیت بۆ باخەکە؟

خدر: وا سەیری ئەکەم نارەوەن خان.. چی لێ بکەم؟

نارەوەن: تۆ لە دار هەڵپاچین ئەزانی؟

خدر: بەڵێ، بەڵام زۆر نا.

نارەوەن: دەی ئەم قەراغەیم بۆ بکێڵەو سەرپەلەکانی ئەو دارانەشم بۆ بقرتێنە، هاوینان زۆر زیاد ئەکەن و ئەچنە ئەو ماڵانەی ئەو دیوەوە.

خدر: وەی بەسەر هەردوو چاوم، تۆ بەس ئەمرکەو ئیتر لێگەڕێ بۆ من.

نارەوەن: ئەوە جاران دارەوان پیاوێکیتری ئەنارد، ئای خوایە!! دڵم کەفی ئەکرد بەدەستییەوە، یەک تەممەڵ و خاو و خلیچک بوو هەر مەپرسە، ئینجا مرخنێ بوو خۆ یەک قسەت لێ نەئەبیست.

خدر: ئەی ئێستا من چۆنم؟ ئیشەکانمت بە دڵە؟

نارەوەن: کورە ڕزگارم بوو، تۆ هەر زوو تێئەگەیت و هەم گورج و گۆڵیشی، بەخوا هەر یەکەم ڕۆژ بە دارەوانم وت جارێکیتر ئەو کابرایەی پێشوو نەنێری.

خدر: ئێستا هەر کاک دارەوانیشمان ناوێ، هەر خۆت ئەمر بکەو چۆن ئەفەرمووی ئاوا خزمەتت بکەم.

نارەوەن: بەساقەی تۆ بم حەمە خدر گیان، لەشت ساغ بێ یاخوا.. خوا ڕزقێکی باشت بدات و ژنێکی جوانیش بێنی.

خدر: کچێ نارەوەن خان ژنی چی؟ جارێ بڕیارم نەداوە، هەر بیریشم لێ نەکردۆتەوە.

نارەوەن: ئاخر ئەگەر کاتت بەسەرچوو، مناڵت لەگەڵ خۆتا گەورە نابن.

خدر: مناڵ بۆ سەردەمی خۆی نارەوەن خان.. (( بیری ئەکەوێتەوە)) ئاهـ برا بە قسەوە مەشغوڵ بووین، کاک دارەوانم هەر بیر نەما.

نارەوەن: ئای لە حمەخدر!!!! دەبا ڕۆژێکیش بۆ من بی و بۆ دارەوان نەبی.

خدر: من بەردەوام لە خزمەتی تۆدا ئەبم، زۆر سوپاس گەورەت کردم نارەوەن خان گیان، با ئێستا بڕۆم زوو دێمەوە. سەعات یەک و نیو.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر.. نارەوەن دەرگا دائەخات و ئەچێتەوە ناو باخەکەو سەیری ئەکاتەوە، چۆن ڕێکی بخات))

Cut

دیمەنی – ٨٩ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر لەسەر قەنەفەیەک ڕاکشاوە.. چیمەن لەسەر قەنەفەیەکیتر دانیشتووە))

چیمەن: ئەو پارەیە زۆر زۆرە داوای ئەکەن.

زوبێر (( خاو قسەکردن)): بە ڕاستی پارەکە زۆرە، بەڵام مەسەلەیەک نییە گەر تۆ ئاسودە بکات و بچنە ماڵی خۆتانەوە.. بەڵام هەرچەند سەر ئەهێنم و سەر ئەبەم، لەوە تێناگەم، بۆ ئەبێ مانگێکیتر پارەکەش وەرگرن و بروسکیش ئازاد بکەن.. کەواتە ئیشیان بە پارە نییە.. شتیتر هەیە کە من تێی ناگەم جارێ.

چیمەن: وایە، ئەگینا ئەبووایە بڵێن پارەکە بهێنەو کوڕەکە ئازاد ئەکەین.

زوبێر (( پاش کەمێک بێدەنگی)): شتیتریش زۆرە ئەم ماوەیە تێی ناگەم.. نازانم بۆ وام بەسەر هاتووە؟!

چیمەن: دڵەڕاوکێ و ماندووییە.. چیتر هەیە بەڵکو من لێی تێ بگەم؟

زوبێر: نا.. ئیشی تۆ نییە.. بۆ نمونە دارەوان ئەو سەرپەرشتیاری بارەی ناردووەتەوە بۆ ماڵەوە، کە بارەکەی لە مەرزەوە هێناوە.. داویەتی بە کێ و کێ ئەوەی پێ ئەکرێ، نە ئەوە ئاساییەو نە ئەو ئیشەش ئاوا ئەکرێ.

چیمەن: سەیرە!

زوبێر: نازانم بۆ ئەبێ نەخۆشێک ئەوەندەی تێ بچێ؟ کە ڕێژوان سەرەوکارییان ئەکاو ئاگای لێیانە.. دەی خۆ کوڕەکەشی هاتۆتەوە هەهە

چیمەن: ماندوێتیتە باوە گیان، هەموو شتەکان تێکەڵ بوون.. ئەمڕۆ وا بکە زۆر ئارام بیت تا سبەی بچیتەوە سەرکارو بیخەیتەوە سەر ڕێڕەوی خۆیان.

زوبێر: چیمەن گیان، ئەو کاتەی هەستت بە ماندوێتیی جەستەت کرد، وەک پڵنگ چۆن لە ڕاوی کەڵەکێوییەک ئەبێتەوەو بە دەسکەوتەکەی ماندوێتیی ئەحەسێتەوە، ڕێک وات لێدێت.. بەڵام کە بیر ماندوو بێ، ڕێک لە گێژەنی دەریا ئەچین، کە دەروویەک

نابینینەوە بۆ گۆڕانکاریی.. ئەوکاتە ئاسوودەیی لە خەونەکاندا زۆرترن، تا وزە ئەکەوێتەوە گەڕو توانا ئەبەخشێت بە مرۆڤ بۆ سەردەرکردن.. من لە ئێستایا وەک خۆت وتت، هەموو شتەکانم تێکەڵ کردووە، گومانی ئەوەش ئەکەم، دیاریکردنی ئەم مانگە بۆ بروسک، تەنها گەمەیەک بێ و هیچیتر.

چیمەن: مەبەستت چییە؟ یەعنی کوشتوویانە؟

زوبێر: وەک وتت تێکەڵ و پێکەڵکردنە.

Cut

دیمەنی – ٩٠ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان و ئەگەر کەسیتریش هەبن لە چایخانەکە دانیشتوون))

ئەردەڵان: جا حەمە خدر لێرە نییە ئەم ئێوارەیە، بزانە چۆن خوا تنۆکی ئیشی بڕی.

هاوڕێ: نائومێد مەبە، چاوەڕێبە.

ئەردەڵان: کورە تازە ئیشی چی؟ زۆر درەنگی کرد وا ئێوارەیە.

هاوڕێ: کورە جاری وا هەیە درەنگانێک ئیش دائەکا، هەر ئەڵێی بەختەبارانەکەی درەنگانی بەهارە.

ئەردەڵان: هههه من و بەخت؟

(( دارەوان دێتە ژوورەوە، لەبەرهەستان و بەخێرهاتن))

دارەوان: ئەوە ئەو هەتیوە لە کوێیە خدر؟ ئەو خوێیەمان بۆ بارکا.

هاوڕێ: وەڵا قوربان لە ماڵی ئێوەیە خەریکی باخەکەتانە.

دارەوان: ئەهـ لەم ژنەی من بێ ئیش دانانیشێ، بەردەوام خەریکی ئیشە، ئەرێ نەبڕایەوە؟

هاوڕێ: ئەوەیان بەخۆی بڵێی باشە، مامۆستا گیان.

دارەوان (( بۆ ئەردەڵان)): ئەی تۆ ئیشت هەیە تەوەزەل؟

ئەردەڵان(( هەڵئەسێتە سەرپێ و پشتە سەری ئەخورێنێ)): نەوەڵا مامۆستا گیان، ئەمرکە.

دارەوان: وەرە ئەو خوێیە بارکە، بەس نەکەویتە نیوە شەو، پەلەیانە.

ئەردەڵان: بەسەر چاو مامۆستا گیان، با بچم حەماڵێکیتریش بانگکەم. (( بەرەو دەرەوە ئەچێت)).

هاوڕێ (( بۆ ئەردەڵان)): نەموت چاوەڕێی بەختەبارانکە؟.. تۆش هەر دەم بەگلەییت هههه

دارەوان: ئاخر حاڵی جوانە، کە ئیشێکت بۆ ئەکا، سەد جار پەشیمان ئەبیتەوە لەوەی بانگت کردووە.

هاوڕێ: بەخوا نەگبەتە ماموستا گیان.. ئەگەر نەگبەت نەبێ، بۆ حاڵی ئاوا ئەبێ؟

(( دارەوان ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٩١ – ڕ- عەسر/ د – بەردوکانی ئامۆو ئاوا:

(( دوو کەس وەستاون گڵۆپ و قاعیدە لە ئاوا وەرئەگرن و پارەکەی ئەدەنێ.. دواتر ئاوا لە دەرەوە بانگی ئامۆ ئەکات و ئەویش دێت))

ئاوا: ئەچم سەیارەکە ئەبەم بۆلای فیتەر.. ئاگات لێرەش بێ.

ئامۆ: تازە درەنگە ئاوا گیان فیتەر چیت بۆ بکا؟ لە بەیانییەوە بۆ نەتبرد؟

ئاوا: وەڵا هەر لە بیریشم نەبوو، ئێستا بیرم کەوتەوە، باوەڕ ناکەم زۆری پێ بچێ.

ئامۆ: ئاخر خۆت ئەزانی ئێستا وەختی قەرەباڵغیەکەیە، چییەتی؟

ئاوا: ئەیلەرزێنێ.

ئامۆ: دەبا تا بەیانیش بیلەرزێنێ، خۆ پەکمان ناخا.

ئاوا: نەوەڵا هەر ناخۆشەو هیچیتر.. (( محە ناشوکر وەک نەخۆش بێ بە بێدەنگ هەندێ پەڕۆی پێیەو ئەڕوات)) ئەرێ سەیری محەکە، ئەو هەموو پەڕۆو پاتاڵەی بۆچییە؟

ئامۆ: دیارە سەرمایەتی داماوە.

ئاوا: هەرچەند سەیری ئەکەم ئەم زستانە ناباتە سەر.. تۆ ئەڵێی چی؟

ئامۆ: خوا ڕەحمی پێ بکا.. وتت چی ئەڕۆی یان نا؟

ئاوا: دەی نارۆم، بەس بەیانی زوو تۆم داگرت ئەیبەم، خۆ کاتی ئیش نییە.

ئامۆ: باشە بەیانی زۆر چاکە. (( ئەچێتە ژوورەوە))

ئاوا (( لەبەر خۆیەوە)): ئەو مەوعیدەشم فت، بزانم نایخاتە بەیانی زووەکەی؟

(( ئاوڕێکی ژوورەوە ئەداتەوە و مۆبایل دەرئەهێنێ ژمارە لێ ئەدا))

Cut

دیمەنی – ٩٢ – ڕ- عەسری درەنگ – د – باخیماڵی دارەوان:

(( نارەوەن دوو کورسی پلاسکۆی بەدەستەوەیە بیهێنێ بۆ حەوشە یان ناو باخەکە.. خدر بە گورجی ڕائەکات بەرەو ڕووی و کورسییەکانی لێوەرئەگرێ))

خدر: ئەوە چی ئەکەی بۆ خاتری خوا؟ بۆ خەجاڵەتم ئەکەی؟ بێنە بێنە بمدەرێ.. ئا ئا خۆ من لێرەم و دەست ئەداتە شت.

نارەوەن: بەخوا خدر گیان ئەزانم زۆر ماندوو بووی، ئەوە کێک و چام کردووە وتم با پشوویەکیش بدەی.

خدر (( کورسییەکان دائەنێت)): ڕازیم نییە من لێرە بم و تۆ دەست بدەیتە هیچ شتێک، بانگم بکەو تەواو.

نارەوەن: ئەوە با مێردو مناڵ ئەوەم بۆ بکەن هههە ساوەڵڵاهی هەر ئەوە ماوە خواردنەکەش بکەم بە دەمیانەوە، خوا نەکا دەستبەرن بۆ شتێک.

خدر: چۆن دڵیان دێت؟ ئەی هاوار، تۆ ئەبێ بەس خزمەت بکرێیت و هیچیتر.

نارەوەن: بەقوربانت بم سوپاس.. نا نا ڕاهاتووم خدر گیان. هەهە (( ئەیەوێ بچێت بۆ چاو کێک.. خدر مەچەکی ئەگرێت))

خدر: ئەوە بۆ کوێ؟ بە سەری باوکم خۆم ئەچم ئەیهێنم، تۆ بەس پێم بڵێ لە کوێت داناوە.

نارەوەن: کورە خووم شەڕ مەکە حەمەخدر، ئاخر دوایی فێر ئەبم بەوانیش وابڵێم.

خدر: جا چییە؟ بەسەر ئەوانیشا بخورە.. تۆ پێم بڵێ لە کوێیە؟

نارەوەن (( ئەگەڕێتەوە)): کێکەکەم لەسەر کەوانتەرەکە داناوەو چاکەش لەسەر تەباخەکەیە.. کوپەکانیش هەر لەسەر کەوانتەرەکەن، چاکەی تێکەو بیهێنە.

(( تا خدر ئەگەڕێتەوە قاپێک کێک و دوو چا لە کوپدا ئەهێنێ.. نارەوەن تەپڵەکێک ئەهێنێ و ئەیخاتە نیوانی دوو کورسیەکەوەو سەیری ئیشەکانی خدر ئەکا، کە لە

باخەکەدا کردوویەتی)) ئەک ماڵت ئاوا بێ، بەخوا گورج و گۆڵە، هیچی وای نەهێشتۆتەوە.. کچێ وەڵا خۆ هەر تەواویش بووە.. ئەک لەشت ساغ بێ و ئەو پارەیەت پێ حەڵاڵ بێ وەک شیری بەری دایکت.

خدر (( دێتەوە)): خەمت نەبێ چایچییەکی باشیشم، هەر پەکم بکەوێ ئەبم بە چایچی. هههه

نارەوەن(( دائەنیشێ لەسەر کورسی و قاچ ئەخاتە سەر قاچ)): فەرموو فەرموو دانیشە.

خدر: ئاخر لە حزوری تۆدا نابێ.

نارەوەن (( دەستی ئەگرێ و دایئەنیشێنێ)): خدر گیان لای من ئەوە گرنگە چەند گونجاو بیت، ئیتر من چەند دەوڵەمەندو تۆ چەند هەژار بیت، هیچ لە بڕوای من ناگۆڕێ.. لەگەڵ منا تەواو سەربەست بەو وەک دایکی خۆت حسابم بۆ بکە.

خدر: دەستت ماچ ئەکەم نارەوەن خان.. تۆ کەسێکی زۆر باشیت، چاکەت لێ ئەبارێ.

نارەوەن: خدر گیان حەزم بە ڕەسمیات نییە.. ئیشی خۆت ئەکەیت بە زیادەوەو منیش ناچارم ڕێزت بگرم.. ئەوە بیروباوەڕمە لە ئیشدا (( لە ڕوخساری ورد ئەبێتەوەو قاچی لەسەر قاچەکەی دائەگرێ، بە دیقەتەوە تەماشای ئەکا))

خدر (( کەمێک بە خۆیا ئەڕوانێ)): خێر نارەوەن خان؟ چی ئەبینی؟ بۆ وا ڕاماوی؟

نارەوەن (( هەر دیقەت ئەدا)): خدر هەرچەندە دیقەتت ئەدەم پێ ناچێ ئەم ئیشە ئیشی ڕاستەقینەت بێت.

خدر (( شڵەژان)): مەبەستت چییە نارەوەن خان؟.. ئەوە نییە ئیش ئەکەم؟

نارەوەن: نا نا زەینم وا ناڵێ.. تۆ لە بێ ئیشیتا ئەمە ئەکەی.. کوێت تەواو کردووە خدر؟

خدر: ڕاستیەکەی پەیمانگە.. بەڵام خۆت ئەزانی دامەزراندن نییەو هەر ئیشێکیش بە شەهادەکەم بکەم دەسکەوتی کەمە.. ناچار ئەبێ ئیشێ بکەم، بتوانم پاشەکەوتیشم هەبێ.. بەڵام ئەوەت بە چی زانی نارەوەن خان؟ تۆ زۆر زیرەکی.

نارەوەن: زیرەکیی ناوێ حمەخدر.. هەرکەس تۆزێ ورد سەنجت بداتێ، بۆی دەرئەکەوێ ئەو ڕوخسارە گەشەی ژێر چڵکەکەت، ڕوخساری کەسێک نییە ئیشی حەماڵیی بێ.. بە پێچەوانەی ئەو کوڕەی ترەوە، کە هەر ڕێک ئەتوت لە منداڵییەوە ئەوە ئیشی بووە.. پێم بڵێ، چەنێکە خەریکی ئەم ئیشەیت؟

خدر (( سەری داخستووەو بە هێمنیی )): سێ چوار مانگێک ئەبێ.

نارەوەن: دڵنیابە حمەخدر گیان کە بۆ ئیشێکی بچووک پارەیەکی زۆرم ئەدایتێ، لە نەشارەزایی و بێ سەلیقەییمەوە نەبوو.. ئەمزانی تۆ زۆر باش ئەگونجێی لەگەڵ هەموو کەسێکا.. نازانم بۆچی حەزم ئەکرد هەمیشە چەند قاتێک پارەت بدەمێ تا دڵخۆش بیت، ئەوە بە مەرجێ هیچ سەرنجیشم نەدابوویت و ئەمەم نەئەزانی کە خوێندەواری.

خدر: تکایەکت لێ ئەکەم نارەوەن خان، ئەم نهێنییە بپارێزە، کە زانیت.. منیش نازانم بۆ ئاسایی بوو بەلامەوە کە تەنها تۆ بەمە بزانیت.

نارەوەن: جا بۆ نهێنیی بێت، ئیشکردن سەربەرزییە.

خدر: نا مەبەستم ئەوە نییە.

نارەوەن: ئەی چی؟

خدر: خەڵک بزانن خوێندنم تەواو کردووەو ئەم کارە ئەکەم، ئیتر بڕوایان پێم نامێنێ و ئیشم نادەنێ، زۆر دڵنیابە لەوە.

نارەوەن: خۆت باشتر ئەزانی.. بەسەرچاو (( خدر ئەیەوێ دەستی ماچکا )) ئەوە چییە حەمەخدر بۆوائەکەی؟ (( خدر بێدەنگ )) وەک وتم من و تۆ هاوڕێ و دایک و کوڕ ئەبین،

دڵنیابە هەرگیز بەو چاوە سەیرم نەکردووی کە ئەوانیتر ئەتبینن.. لە نهێنییەکەت و هەموو نهێنییەکیتریشت بێخەمبە.. لای منەوە هیچ قسەو باسێکی تۆ ناچێتە دەرەوە.

خدر: دەستت ماچ ئەکەم نارەوەن خان.

نارەوەن: ئۆو تکایە.

خدر: باشە زۆر سوپاس گەورەت کردم.. بەڕاستی ئەمزانی زۆر گەورەیت، بەڵام ئێستا زانیم چەند میهرەبانیشیت، تۆ گەورەی هەمووانی لای من، باوەڕ بکە.

نارەوەن (( دەست ئەگرێ بە دەمییەوەو پێ ئەکەنێ)): چاکەشمان سارد بووەوە هەهە.

خدر: هەر ئاگامان لێی نەما.

(( تیرۆژ دێتە ژوورەوەو ئاوڕێکی بەر دەرگا ئەداتەوە وەک یەکێکی بەدواوە بێت))

نارەوەن: کچی دایەی بەخێر بێیتەوە، ئەوەش کاک حەمەخدرە، ئەها ئەو باخەی چۆن بۆ ڕازاندوومەتەوە، دەستخۆشیی لێ بکە.

(( لە میوتیدا خدر لەبەری هەڵئەسێت و پێکەنین و یەک دوو دایالۆگی کورت))

Cut

دیمەنی – ٩٣ – ش/ن – ژوورەکەی لادێ:

(( ژوورەکە تاریکەو بروسک بە کۆڵەکەی ناو ژوورەکەوە بەستراوەتەوە.. هەردوو قاچی درێژ کردووە.. سەرەو مالە بە دەموچاوی هەڵپێکراوەوە دێنە ژوورەوەو گڵۆپ هەڵئەکەن))

بروسک: هەر خەریک بوو زیرەم ئەکرد لەو هەموو تایکییە.

مالە: ئەک زیرەکەی، بە خۆیشی ئەڵێ پیاو.

بروسک: وەڵا باش بوو هاتن، زۆریشم برسیی بوو.

سەرە: باشە بەڕای تۆ، کە چوویتە گۆڕە تاریکەکەتەوەو کەسیش نەیەت گڵۆپت بۆ هەڵبکا، برسی بی باشترە یان تێر؟

بروسک: من دڵنیام ئێوە نامنێرن.. چونکە ئەمڕۆ بڕیارمدا پارەیەکی زۆر باشتان بدەمێ، گەر لێرە ڕزگارمکەن.

مالە: دەی ئێمەش ئەمڕۆ فەرمانمان پێکرا، ببین بە ئیزرائیلی جەنابت و ڕوحە پاک و بێگەردەکەت بکێشین.. پارەی تۆمان ناوێ.

سەرە: جا پێت خۆشە بە پێوە بتکوژین، یان هەرئاوا؟

بروسک (( پێکەنین)): جا کوشتن کەوتنە سەرباری بۆچییە؟ چۆنتان پێ خۆشە ئاوا.

(( سەرەو مالە چپە ئەکەن))

سەرە (( بۆ مالە)): زۆر باشە من ئەیکوژم. (( بۆ بروسک)) هیچت هەیە بیڵێی هەتیو؟

بروسک: جا وا هەشمبێ؟ بۆم ئەگەیەننە شوێنی خۆی؟

مالە: گەیاندنی چی؟ خۆ پۆستەبەری جەنابت نیین؟

بروسک: کەواتە هیچم نییە.. فەرموون ئیشی خۆتان بکەن، بەڵام تکایە تۆزێ بە خێرایی.

ماله: جا با تۆ هەر گاڵتەت پێی بێ.

بروسک: باوەڕ بکە گاڵتەم پێی نایەت، بەڵام ویستم دەستوبرد بکەن و منیش زووتر گیانم دەرچێ.

ماله: دەی سەرە، پێویست بە قسەیتر ناکا زرمەی لێ هەستێنە.

(( سەرە میلی دەمانچە ڕائەکێشێ و ئەیخاتە سەر سەری))

ماله: ئەوە بۆ نایتەقێنی؟

سەرە: گوناحە.

ماله: خۆ خوێڕییە هاتینە سەر کوشتنیشی، کەچی ناترسێ.

سەرە: بەڵام لە تاریکیی زیرەی کردووە.

بروسک: ڕاست ئەکەن.. بەڵام بایی ئەوەندە ئەقڵم هەیە کە بزانم ئێوە ئیشی پارەتان بە من هەیە، لەبەرئەوە وا زوو نامکوژن، خۆ ڕەنگە هەر کە پارەکەشتان دەستکەوت، ئیتر لێم بگەڕێن و نەمکوژن.

سەرە: دە ئەو خواردنەی بۆ دەرکەو بیدەرێ مادام ئەوەندە زیرەکە.

(( ماله لە ژێر قەمسەڵەکەیەوە خواردنی بۆ دەرئەکاو سەرەش، سێ دەبە ئاوی بۆ دەرئەکاو ئەیدەنێ))

Cut

دیمەنی – ٩٤ – ڕ/ن – ماڵی ڕێشار:

(( کرمانج و ڕێشار دانیشتوون..))

ڕێشار: هەندێ دان و ئاو بدە بەو پاسارییانە، با دەست بەتاڵ نەبن.

کرمانج: گەورەم کوا پاساریی لێیە؟

ڕێشار: گەمژە، کچەکان ئەڵێم، بۆ ئەقڵت بە هیچ ناشکێ؟! هەموو ئەمڕۆ هەر جریوەیان ئەهات.

کرمانج: چی ئەڵێن گەورەم.

ڕێشار (( مۆبایلەکەی دەرئەهێنێ)): ها گوێیان لێبگرە. (( کلیک لەسەر مۆبایلەکە ئەکات و دەنگی بێستان و تافان ئەبیسترێ))

تافان (( دەنگ)): هەر زۆر زۆر پیاوی باشن، بزانە چۆن خزمەتمان ئەکەن؟!

بێستان: بڕیاری پەلە مەدە، جارێ زۆر زووە.. نابێ ئیشێک هەبێ بیکەین؟

تافان: کچێ ئیشی ئێرە ئەبێ چی بێ؟ وەڵا ئەوەی بۆ ئێمە لواوە بۆ بزنەکەی دێلێژەش نەلواوە.

بێستان: پەلە مەکە تافە گیان، با بزانین ئەو ئیشەی بە ئێمەی ئەسپێرن پێمان ئەکرێ یان نا؟

تافان: کچێ هەر باسی ئیش مەکە بێستان گیان.. تۆ قۆزییەکەی کاک ڕێشار بۆ باس ناکەی؟ خوشکی خۆی حەیرانی ئەبێ.

بێستان: خوا لە کەسی خۆی و خۆشەویستی خۆی نەسێنێ.

تافان: من زۆر دڵخۆشم بەم ئیشەو بەو پیاوانە.. (( وەک ڕێشار بێتە ژوورەوە))

(( دیمەنەکە ئەگۆڕێ بۆ وێنە، لە دوای ئەوەی تافان بەخێرهاتنی ئەکا))

ـــ تابع ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــ

دیمەنی – ٩٥ – متبوع - ڕ/ن – ژووری بێستان و تافان:

(( بێستان و تافان لەبەر ڕێشار هەستاون کە دێتە ژوورەوە))

بێستان: فەرمووو کاک ڕێشار!

ڕێشار: فەرموون دانیشن!! لە هیچتان کەم نییە؟

بێستان: لە سای سەری جەنابتەوە نەوەڵا زۆر سوپاس، هەمووو شتێک هەیە.

تافان: وەڵا ئەگەر زەحمەت نەبێ کاک ڕێشار، پێیان بڵێی بەڕادێکی ئاومان بۆ بێنن.

ڕێشار: بەسەرچاو.. (( دەست ئەکا بە بەرباخەڵیا، دوو بەستە دە هەزارییی، واتە دوو ملیۆن دەرئەهێنێ و ئەیخاتە بەردەمیان)) فەرموون ئەمەش بۆ جلوبەرگ و خۆڕازاندنەوەی کەشخەی تازەتان.

بێستان: زۆر سوپاس کاک ڕێشار گیان، بە راستی من لە هەقی خۆم زیاتر پارەم لەکەس وەرنەگرتووە، وەریشی ناگرم.. ببورە.

ڕێشار (( خۆی کەمێک گرژ ئەکا)): ئەوە بۆ تۆ نییە دادە گیان، ئەو پارەیە بۆ جلوبەرگی مۆدێل تازەیە، بە جۆرێک لایەقی ئەم کۆمپانیا گەورەیە بێت.. خۆ بە نیاز نیین هەر بەو جلانەوە بێن و بچن، ئەوە لێرە قبوڵ نییە.

تافان (( دەست ئەبات و ملیۆنەکەی خۆی هەڵئەگرێ)): وەڵا ڕاست ئەکەی، ئەم جلانەمان لە جلی کارەکەر ئەچێ، ئەبێ مارکە بکڕین... (( ڕێشار ئەچێتە دەرەوە))

ـــــ تابع ـــــــــــــــــــــــ Cut ــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٩٦ – متبوع – گەڕانەوە بۆ دیمەنی - ٩٤- :

(( گوێگرتن لە دەنگی بێستان و تافان))

تافان (( دەنگ)): بەخوا تۆ وابکەی ڕزقمان ئەبڕی، ناهێڵی پێنج هەزارییەکمان دەسکەوێ.

بێستان: دەی بەخوا تۆش وا بکەی، سوک و ڕیسوامان ئەکەی.

ڕێشار (( مۆبایلەکە ڕائەگرێ)): بینیت ئەگەر ئیشیان نەبێ چەند بەواتەواتن؟ سەرو ئیشێکی بچوکیان پێ بسپێرە.

کرمانج: ئەک ئافەرین گەورەم، ئەو گوێ لێگرتن و دەنگ تۆمار کردنەیان، دڵنیایی زۆرترمان ئەداتێ.

ڕێشار: ئەی بێ ئەقڵ خۆ وەک تۆ نیم! ئەبێ بزانم بیر لە چی ئەکەنەوەو چەند بە کەڵکی ئەو ئیشەم دێن یان نا؟!!!

کرمانج: بەڵێ زۆر ڕاستە.. ئەی بۆ جوانییەکەیان ئەڵێی چی؟ ئەی ئەو قسە خۆشانەی تافانەکەیان ئەیکا؟

ڕێشار (( تورە)): ئەوە دواجار بێت بیر لەوە بکەیتەوە کرمانج، فەرمانی پاشایە، هەر کەسێک هەوڵێکی بچوکیشیان بۆ بدا، ئەکوژرێ، با ئەوە بزانی.. خۆیان ژنن و لە نێوانی خۆیانا هەر قسەیەک بکەن، ئەبێ من دوای ئەو جۆرە قسانە بکەوم؟؟؟.. ئەوان لێرە خوشکی ئێمەن و هیچیتر، تێگەیشتی؟!

کرمانج: فەرمانتە گەورەم.

Cut

| | |
|---|---|
| دیمەنی – ٩٧ – ر/ن- نەخۆشخانە:<br>( سەلوا نازوباز ئەکا لە تێل کردنەکەدا )<br>سەلوا: ١- نا ئێستا زۆر باشە، کاکیشم هاتووە لایەتی، وتم فرسەتە با ئێستا قسەت لەگەڵ بکەم..... ٢- بەڵێ.. سوپاسیشم کردی.... ٣- جا تۆ شیرین کردنت بۆچییە لە دڵی ئەوا؟ ها؟!..... ٤- ئەوە چییە کاک ڕێژوان؟ مەبەستت چییە تێناگەم!..... ٥- وەڵامی چی؟ ئەوە تۆ باسی چی ئەکەی کاکەگیان؟...... ٦- بە هەڵە تێگەیشتووی کاک ڕێژوان.. دڵم هیچی تیا نییە تا چاوم پێی وتبی.. ئەم دەرگا کردنەوەیەشت کتوپڕ بوو بەلامەوە، چاوەڕوانی ئەمەم نەئەکرد.... ٧- نەبەخوا هیچ دڵم لای ئەم باسە نەبووەو هەرگیز لەو خەیاڵەدا نەبووم ئەمەم پێ بڵێی، هەر تاسام باوەڕ بکە..... ٨- نا.. بۆ کەس، کەس نییە.. بەڵام هەستی تۆم پێ سەیرە چۆن بەو کتوپڕیەو لەم ماوە کەمەدا توانیت ئەمە بە من بڵێی؟ نازانم بڵێم چی.. بە ڕاستی بیرکردنەوەیەکی وردی ئەوێ، بە تایبەت کە باوکم هەر من شک ئەبا خزمەتی بکەم...... ٩- باوەڕ بکە ناتوانم ئاوا بە خێرایی بڕیار بدەم، بوارم بدەرێ بیری لێ بکەمەوە. (( هەندرێن بە دەنگی کەمێک بەرز بانگی سەلوا ئەکا )) جارێ بای کاکم بانگم ئەکا.. بای..... ١٠ – باشە باش.. بای.<br>Cut | دیمەنی – ٩٨ – ر/ ن – کۆمپانیای زوبێر/ ژووری ڕێژوان:<br>(( ڕێژوان بە هێمنیی))<br>ڕێژوان: ١- زۆر باشت کرد، ئەی هیچت پێ وت؟.... ٢- سوپاسی چی؟ هەر شیرینت کردمایە لە دڵیا بەسی بوو..... ٣- ئا ببورە نەمزانی، خۆ تا ئێستا بیرم نییە خۆم لای تۆ شیرینکەم..... ٤- ڕاستیەکەی لەو ڕۆژەوەی تۆم دیوە، ئارامم لەبەر براوە، بەڕاستی عاشقت بووم.. تۆش لە چاوما ئەوە بەڕوونیی ئەبینیی، ئاخر خۆ چاو ناتوانێ وەک زمان شت بشارێتەوە، چونکە وایان ڕانەسپاردووە.. دڵنیام تۆ ئەوەت زانیوە، چونکە منیش لە چاوتا وەڵامەکەیم وەرگرتووە..... ٥- وەڵامی دڵت ئازیزم، هەموو شتێک لە چاوتا ئاشکرایە! .... ٦- دڵنیام گاڵتە ئەکەی.... ٧- باشە گریمان هیچ هەستت پێ نەکردووە، خۆ ئێستا زانیت، ئەڵێم چی؟ بەس توخوا قسەی دڵتم بۆ بکە.. کەس لە ژیانتا هەیە؟..... ٨- باوکت ئەخەمە سەر سەرو سەر چاوم، تۆ کێشەی ئەوت نەبێ، دایکی منیش هەر منی هەم بۆ هەموو شتێک.. ئەوسا بیری لێ ئەکەینەوە، تۆ بەس بڕیار بدەو هیچیتر ....... ٩- باشە گیان با نەزانێ تێل ئەکەی، خێرا بچۆ بە دەمییەوە، بەس بیرت نەچی زوو وەڵامم بدەیتەوە..... ١٠- بای هەناسەکەم.<br>Cut |

دیمەنی – ٩٩ – ڕ/ د – بەردەم دوکانی پێڵاوفرۆشێک:

(( خدر، تەماشای پێڵاوەکان ئەکات و جاروبار دەست ئەداتە یەکێکیان و تەماشای ئەکات و دایئەنێتەوە.. هەندرێن ئەیبینێ و دێت بۆ لای.. تەقەی پێڵاوەکانی دێت))

هەندرێن(( لە پشتی خدرەوە)): با منیش جوتێکی تازە هەڵگرم، بۆ کێی کۆکەینەوە؟

خدر(( ئاوڕ ئەداتەوە)): بۆ منداڵەکانت، ناڵێی دووانم هەیە؟

هەندرێن: ئەی خۆم شتێکم پێ نابڕێ؟

خدر: ئەی ئەوە نییە پێڵاوەکانت تەقەی دێت، پەلەت چییە؟

هەندرێن: ئەوە فرتوفێڵی خۆمە مامەخدری گوڵ.

خدر: فرتوفێڵی چی؟ ئەگەر تازە نەبێ چۆن تەقەی دێت؟

هەندرێن: کاکە ئەوەی من هەر کە کۆن بوو، ئیتر کونێکی بچووک ئەکەمە هەردوو پاژنەکەی، سەرو چەوێکی مام ناوەندیشیان تێ ئەکەم.. خۆ خەڵک ناڵێ ئادەی پێڵاو داکەنە با بزانم ئەو تەق و هوڕەی لە چییە؟ وا ئەزانێ تازەیەو ئەهـ .

خدر: ئافەرین: گرنگ ئەوەیە کەس نەزانێ برسیت.. بەڵام ئەوە بۆ من نالوێ برا.. ئەوەنە پێی ئەسوڕێمەوە، مانگیی جووتێکم ئەوێ، هەر ئاگاشم لێی نامێنێ کۆنە یان نا، تا نەدڕێ و ئاو نەیەتە پێمەوە دەستی لێ هەڵناگرم هههە.

هەندرێن: ئەمجارە من بە دڵی خۆم بۆت هەڵبژێرم، تازەترین مۆدێلت ئەکەمە پێ.

خدر: ببورە هەندرێن گیان، من بە دوای مۆدێلا ناگەڕێم.. دە دوکان ئەکەم تا قایمترین جووتم دەست ئەکەوێ، گوێم لە جوانیی و ناشرینییەکەی نییە، گرنگ ئەوەیە زیاتر بەرگە بگرێ.

هەندرێن: دە خۆت هەڵی بژێرە کاکەی من.

(( هەردووکیان بۆ پێڵاو ئەگەڕێن)) ________________________ Cut

دیمەنی - ۱۰۰ – ڕ/ د – بەردەمی ماڵی شەنیا:

(( نیزام سەیارەی پێیەو ئەیەوێ بڕوا.. شەنیا بە جلی ماڵەوە لەبەردەرگایە))

شەنیا: ها باوکە گوڵ؟ ئەمە هاوڕێکەت بوو کە ئەچی بۆلای؟ خۆ زۆر لە تۆ منداڵترە.

نیزام: کچم ئەمەوێ شتێکی لێ هەڵکڕێنم، ئەگینا ئیشم چییە بە هەڵشۆ؟ دەوڵەمەندەو ئەڵێم سا خوایە ئیشێکم پێ ڕاسپێرێ.

شەنیا: ئەو چاوبزە؟ بۆ ئیشی چییە؟

نیزام: قاوەخانەی بۆ ژنەکەی داناوەو خۆیشی پیشانگەی سەیارەی هەیە، ئێواران ئەچێ، بەرناکەوێ.

شەنیا: جا خێر لە دەستی ئەبێتەوە؟

نیزام: جاروبار کە خێرێکی باش ئەکا، خراپ نییە، هەر لەڕێوە ناوی منی لێ ئەهێنێ.

شەنیا: ئەی کەواتە چۆنە پێی بڵێی بچم لای ژنەکەی ئیش بکەم.

نیزام: بە کەڵکی تۆ نایەن شەنیا گیان، لەگەڵ ژنەکەی ناسازێن.. تا ئێستا کچێکیان بە شاگرد ڕانەگرتووە، ژنەکەی دڵی لێی پیسە.

شەنیا: دە تێی هەڵدە، وامزانی کەسی تێگەیشتوون.

نیزام: جا ئەگەر خۆم بمزانیایە بە کەڵک دێت، دەمێ بوو پێموتبوون.. دەی خواحافیز.

شەنیا: بای.

(( شەنیا ئەچێتەوە ژوورەوەو نیزام ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ۱۰۱ – ش/ن – ژوورەکەی لادێ:

(( بروسک سەر هەڵئەبڕێ، وەک تازە ڕوناکیی بینیبێ چاوی کز ئەبێ و ئەتروکێ.. گڵۆپ هەڵئەکرێت و سەرەو مالە دەمامکدارن، دێنە ژوورەوە، سەرە دەستی ئەکاتەوەو مالەش سێ لەفەی ئەخاتە بەردەم بە ساردیی و دوو سێ دەبە ئاوەوە. سەرە شەرواڵەکەی کونی جگەرەیەکی تیایە.. مالە چەند دڵۆپە بۆیاغێکی شین بە کراسەکەیەوە، گالاکسی پێیە))

بروسک: ڕێک کاتی خۆتان بوو، من هەموو جارێک دڵم بەو دەنگی دەرگاو گڵۆپ هەڵکردنە ئەگەشێتەوە، ڕاهاتووم کە نانەکەیە هههە.

مالە: ئەک باب مردوو بی هەتیو چەند سکەڕۆیت؟! ئەم هەموو خواردنە ئەکەیتە کوێوە مالم ئاوا نەکردی؟

بروسک: چی بکەم برسیمە، پیاو کە هەر دانیشت نانیش زۆر ئەخوا.

سەرە: دەی ئیشەڵڵا خەزورە خوێڕییەکەت ئەو پارەیەمان زوو بۆ ئەنێرێ.

بروسک: من ژنم نەهێناوە، خەزوری چی؟

مالە: دیارە تۆ بەس قۆڵی چەتیوی خەڵک ئەبڕی.. ئەی بە خۆڕایی زوبێرە بێ پشتەمل پارەی ئازاد کردنت ئەدا؟

بروسک: کاک زوبێر بۆ پارە بۆ من ئەدا، هیچی من نییە؟

مالە: نا نا چاوبۆق خۆت لە گێلیی مەدە، دەستی کچەکەیت بڕیوەو ئەویش لە پەرۆشیی بۆ کچەکەی ۵۰ هەزار دۆلارت بۆ ئەدا.

سەرە: یەعنی ئەگەر نەیدا ئەتکوژین، ئەگەر پارەکەیداو چوویتە دەرەوەو کچەکەیت نەهێنا، ئەوا زوبێرە بێ پشتەمل ئەتکوژێ.. ئەگەر کچەکەشی بهێنی، براکانی چاوسەوز ئەتکوژن، هههە

مالە (( پێکەنین)): یەعنی تۆ کوژراوی کوژراوی، هیچ ڕێگەیەکی ڕزگاربوونت نییە.

بروسک: بوەستن کاکە بوەستن، وا نییە.. بە ئێوەشەوە کەس من ناکوژێ دڵنیام..

سەرە: دەی سا بەو کەللەخڕەو بەو چاوە بۆقنەت، تۆ کوژراوی، ئیتر هەر کەس بتکوژێ.

مالە: جارێ من ئەڵێی بەسەر ئاگرەوەم، یا بۆ کوشتنت، یا ئازاد کردنت..

بروسک: بۆ برا بۆ؟ بۆ ئەوەندە بە پەلەی؟

مالە: ڕاستییەکەی تەحەمولی ئەم هەموو خواردنەم نەماوە بەیانی و ئێوارە لە شارەوە بۆتۆی سکەڕۆی بێنم، ماندووت کردم.

سەرە: لەبەرئەوە وا بزانە بە دەستی ئێمە ئەکوژرێی.

بروسک: نا نا، ئێوە دڵتان زۆر باشە، ٥٠ هەزار دۆلار لە گۆڕێدایە، کەم نییە هههه

مالە (( بۆ سەرە)): هەتیو بەخوا چەقاوەسووە، لە فڕێنراوەکانیتر ناچێ، خۆ یەک مسقاڵ ناترسێ، پێئەکەنێ.

بروسک: ئاخر ئەوانیتر نەیانئەزانی مەسەلەکە دۆلارە.. ناهەقیان نەبووە بتۆقن... باشە ئێوە کێ ڕایسپاردن بمفڕێنن (( سەرە لە پشتەوە بە ئەژنۆی پیا ئەکێشێ)) کورە سوک پشتم شکا.

سەرە: بە قسە خۆشەکانمان تێ نەکەوی هەتیو، چۆنمان فڕاندی و چۆن شین و شەپۆڕمان پێ دابەستی، هەر ئەو دووەی ئەوساین، قوزەڵقورتەکەت بخۆو فزەت لە دەمەوە نەیەت.

(( بروسک دەست ئەکا بە نانخواردن))

Cut

دیمەنی – ١٠٢ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێرو چیمەن دانیشتوون، چیمەن قاوە ئەخواتەوە))

زوبێر: ئا.. بەیانی ئەچمەوە.

چیمەن: باوکە پشوو بدەی باشترە، بەڵکو سبەی بەخێر بگەڕێ و هەموو شتێک کۆتایی بێت.. بەخوا زیرەک بووی کە ئەتووت ئەو مانگە بۆ هەڵخەڵەتاندنەو ڕاست نییە.

زوبێر: ئەی چۆن؟..... مادام وتیان پارەکە بێنەو هەر خۆت بەو پۆلیس ئاگادار نەکەیتەوە، ئارام بوومەوە.. ئێستا زۆر باشم ئەتوانم لە شتەکان تێبگەم.

چیمەن: بەڕای تۆ چی ئەبێت؟

زوبێر: هەرچییەک رووبدا لە ئێستا باشترە.. کچم لە هەر تەنگ و چەڵمەیەکدا دەرکەوتنی ئەنجامێک گرنگە، ئیتر تۆ ئەتوانی لەسەر ئەو ئەنجامەوە بڕیار بدەی.. جا چاک یا خراپ، ئەوە ژیانەو هەردووکی پێویستە.

چیمەن: بۆ نمونە ئەگەر خراپ بێ و کوشتبێتیان چی؟

زوبێر: ئەوکاتە ئەزانی چۆن دەرەقەتی ئەوەش دێین.. ئەزمون گرنگە بۆ خەڵک.. ئەها تۆی بێ ئەزموون، تەنها بیر لە هاتنی موسیبەتێکی تر ئەکەیتەوە.....

چیمەن (( قسەی پێ ئەبڕێ)): کەواتە تۆ دڵت باش ئەهێنێ؟!

زوبێر: نە باش نە خراپ.. من چاوەڕوانی ئەنجامێک ئەکەم و بەس، ئەوە گرنگترینە.. ئای چەندە زۆرن ئەوانەی چاوەڕوانی دەرەنجامی باش بوون و خراپ کەوتۆتەوە، یان چاوەڕوانی خراپ بوون و باش کەوتۆتەوە؟!

چیمەن: کەواتە سبەی یەکلاکەرەوە ئەبێ؟

زوبێر (( خۆی لە قسەکەی لائەدا)): ئا بۆ نمونە من لەوە تێگەیشتم کە دارەوان ئیشێکی بەو بارە هەبوو، بۆیە هەندرێنی لێ دوور خستۆتەوە.. ئەها چەند گرنگە پێیەکت مابێ بگەیتە ئەنجام؟!

________ Cut ____________

دیمەنی – ١٠٣ – ڕ/ د – بەردەمی چاخانەکە:

(( محە ناشوکر دانیشتووە، گۆچانێکی بەدەستەوە گرتووە، هەندێ وردەواڵەشی لەبەردەمیدا داناوە بۆ فرۆشتن.. لە ناو سندوقێکی تەختەی کۆنی ملدا، وەک پیل و پاکەت و پسکیت و لەو بابەتە.. دارەوان بە بەردەمیا تێپەڕ ئەبێت و ئەگەڕێتەوە بۆ لای))

دارەوان: ئەوە چییە محە؟ ئەڵێی ئەتەوێ خۆت بژێنی؟

محە: ڕاستیەکەی وامنیازە کاکە دارەوان.

دارەوان: محە من هێشتوومە تۆ پێویستیت بە شتێک هەبێ؟ بۆ خۆت ماندوو ئەکەی؟

محە: قوربان گیان مەمنونی تۆم و هەر بە پارەی تۆش ئەم شتانەم کڕیوە..

دارەوان: بڕۆ محە بڕۆ.. ناهێڵم پەکت بکەوێ. ئەمە مەکە.

محە: قوربان گیان ئەمە ئەو نینۆکەیە سەری خۆمی پێ ئەخورێنم، من ئەزانم تۆ بەڕاست حەز ئەکەی ئەو نینۆکەم نەبێت و هەر خۆت هاوکاریم بکەیت.. بەڵام بە ڕاستی ئەمە دڵفراوانی نییە قوربان، ئەمە ڕاهاتنی ئێوەیە، حەز ئەکەن خەڵک خۆی هیچی پێ نەکرێ، تا بە دڵی خۆتان بەکاری بهێنن.. تا خەڵک چاو لە دەستی ئێوە بێ، ئێوە دڵنیاتر ئەبن.

دارەوان: باشە محە من خراپەی چیم لەگەڵ کردووی؟ ئەم هەموو قسە ناخۆشە بەرەو ڕووم ئەڵێی؟.. بەس ڕاستیان وتووە فەقیر بەکەڵکی ئەوە نایەت چاکەی لەگەڵ بکەی، ئێوە هەر بۆ ئەوە باشن بە شەق لەگەڵتانا بجولێنەوە.

محە: ئەها تۆزێک جولاندتم چۆن ناواخنی خۆت دەرخست؟!.. ئێوە ڕێک ئاوان دارەوان ئەفەنی، هەموو وا سەیری فەقیر ئەکەن.. خوا ئەو فەقیرە بگرێ باوەڕ بە قسەی ئاڵ و والاتان ئەکا.. لە خوا بەزیاد بێ بۆ یەک چرکە من ناگرێتەوە.

دارەوان (( تووڕە)): ئاحححححح محەش فێری دەمدرێژیی بوو. ____________

Cut ____________

دیمەنی – ١٠٤ – ڕ/ د – بەر زانکۆیەک:

(( تایەر، لە چاوەڕوانیی تیرۆژدا وەستاوە.. تیرۆژ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا دەرئەکەون لە زانکۆ دێنە دەرەوە، تایەر دائەبەزێت و بەرەو ئەو ڕێگەیە ئەچێ، کە تیرۆژ تەنیا ئەکەوێت و بۆی ئەچێت.. ئەچێتە بەردەمی))

تایەر: بە یارمەتیت زەحمەت نەبێ.

تیرۆژ: فەرموو (( کەمێک دیقەتی ئەدا وەک بینیبێتی))

تایەر: من لەو ڕۆژەوەی تۆم بینی لەبەردەرگای خۆتان، عاشقت بووم و حەزم لێکردووی.

تیرۆژ (( بە هێمنیی و خەندەوە)): ئێ، باش.

تایەر: ناوم تایەرەو سەیارەو خانوشم هەیە.

تیرۆژ: باشە، چیتر؟

تایەر: خانویەکیشم هەیە لە.......

تیرۆژ: ناڵێم چیترت هەیەو نییە، ئەڵێم قسەی تر چیت هەیە؟

تایەر: وەڵا ئیتر دوای سەیارەی براکەت کەوتم هەر بەم دەم و دەستە شوێنەکەتم دۆزییەوە.

تیرۆژ: ئەوە تۆ خەڵکی کوێی؟

تایەر: بیللاهی هەر لەم شارە لە دایک بووم، دایک و باوکم کە لە ئەنفالەکە قوتاریان بوو، ئیتر لێرە گیرسانەوە.. خزمان زوربەی ........

تیرۆژ (( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئەوە تۆ بە نیازی هەموو ڕووداوەکانی ئەنفالم لەم سەر جادەیە بۆ بگێڕیتەوە کاکە؟

تایەر: نەوەڵا هەر مەخسەدم ئەوە بوو تێت بگەیەنم کە خەڵکی ئەسڵی شارم و تۆم زۆر خۆش ئەوێت و چووی بە دڵما.

تیرۆژ(( ئاهـ هەڵئەکێشێ)): ببورە ناتوانم پەیوەندیی ترم لەگەڵایە.

تایەر: بەوخوایە ڕازی نەبی بە براکانت ئەڵێم خەریکی کەپڵ کەپڵێنەیە لەگەڵ هەتیو و مەتیوا.

تیرۆژ (( بە سەرسامییەوە)): ئەی ئەگەر بە تۆ ڕازی بم، ئیتر پێیان ناڵێی؟

تایەر: خوا هەردوو چاوم کوێرکا ئەگەر لە دەمم بێتە دەرەوە.

تیرۆژ: یەعنی بۆ خۆت قەینا، بەس بۆ کوڕیتر ئەچی بە براکانم ئەڵێی؟

تایەر: ئاخر بۆ خۆم جیاوازە.

تیرۆژ: ئەی ئەگەر خوشکەکەت لەگەڵ کوڕێک بیکەپڵێنێ؟

تایەر (( بە مینجە مینج)): ئاخر ئەوە جیاوازەو خوشکی من بۆ ئەو شتانە دەستناداو....

تیرۆژ (( لیڤێکسەکەی دەستی ئەدا بەسەریا)): بڕۆ هەی ناپەسەند سەرە ڕێم بەردە، ئەگینا بەو پۆلیسانە ئەڵێم هەر ئێستا بتگرن.. دە بڕۆ هەی بەدخوو.. بڕۆ بە براکانیشم بڵێ، چیت لەدەست دێ بیکە ناشرینی پیس.

تایەر (( لە کاتی قسەکانی ئەودا سەر هەڵئەکڕێنێ کە لیڤێکسەکەی بەرکەوتووە)): باش، باشە باش هەی لۆق درێژی سیسکۆس.. شەرت بێ دەردێکت پێبەم، نەتبینیبێ. (( ئەیەوێ بڕوا)).

تیرۆژ(( هەناسەبڕکێ)): بەو خوایە لەبەر دەرگای خۆمانا بتبینمەوە، ڕێک بە براکانم ئەڵێم ملت بۆ لە گەچ بگرن.

تایەر (( ئەڕوا)): هینە، براکانی هینن!! موزەمیدن.. نا نا لەفاف پێچن.. نا نا تەڕەماشن. ____________ Cut ________________

دیمەنی – ١٠٥ – ڕ- دەمەو ئێوارە/ د – دەشتاییەکی تەخت:

(( لە دەشتاییەکی تەختدا چەند بەردێک هەیە، لەو دیوی بەردەکانەوە شاخ یان گردی نزیک هەیە.. زوبێر سەیارەیەکی بەرزی پێیەو بەرەو بەردەکان ئەچێت، مۆبایلی بە گوێچکەوەیە، بە میوتی نیشان ئەدرێت، تا ئەگاتە نزیکی بەردەکان، دائەبەزێت و جانتایەکیش لەگەڵ خۆی دائەگرێت))

زوبێر (( جانتاکە بەرز ئەکاتەوەو بە مۆبایل)): بەڵێ هێناومە ئەوەتا.. کوا بروسک؟

دەنگ: لەبەردەم ئەو بەردانە دانیشە تا خۆرئاوا ئەبێ، ئەوسا قسەیەکی لێ ئەکەین.

زوبێر: ماوەکەی زۆرە برا، زۆر دڵنیابە کەسم بەدواوە نییە، هەر خۆم هاتووم، گەروا نەبوو، یەکێک لەسەرەوە دابنێن جاسوسم لێ بگرێتەوەو یەکەم کەس تەقە لە من بکا.

دەنگ: تۆ ئێمە فێر مەکە.. بێدەنگ دانیشەو فزەت لێوە نەیەت، ئەوەی پێت ئەڵێم ئەوە جێ بەجێ ئەکەی.. مۆبایلت بکوژێنەرەوە، کە خۆر تەواو ئاوا بوو مۆبایلەکەت هەڵبکەرەوە، تێگەیشتی؟

زوبێر: باشە وائەکەم.

(( زوبێر لە پەنا بەردێکا پاڵ ئەداتەوەو دائەنیشێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦ – ڕ دەمەو ئێوارە/ د/ بەردەمی ماڵی دارەوان:

(( گێلاس لەبەردەرگای ماڵی دارەوان وەستاوەو نارەوەن دێت دەرگای لێ ئەکاتەوە))

نارەوەن: فەرموو گێلاس خان گیان فەرموو، دەتوخوا وەرە ژوورەوە.

گێلاس: نایەم.. ئەوە تۆ عەیب ناکەی لای خەڵک هەموو عەیب و عارم هەڵئەماڵی و هەرچیم لا باسکردووی ئەیگێڕیتەوە، کە خۆشم ئەبینی ئەوەنە زمان لوسیت؟

نارەوەن: ئەیەڕۆ گێلاس خان گیان باسکردنی چی؟ خوا هەردوو چاوم کوێرکا ئەگەر باسی تۆم هەر کردبێ.

گێلاس: سوێند مەخۆ، باشت ئەناسم هەر خەریکی قسە هێنان و بردن و بوختان هەڵبەستنی، باجی ناسکە هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە، زۆر عەیبە بۆ تۆ.

نارەوەن: ئەک خوا ڕووی ڕەشکا وەک ڕەشی کردووە، ئەگەر ناوی تۆ هاتبێ بە لەفزما.

گێلاس: ئەو قسانە مەکە، من ڕووبەڕووتان ئەکەمەوە.. ئەی ئەگەر کردبووت؟

نارەوەن: ئەگەر ئەوەنە بێعار بێ لەبەردەمی خۆشما بڵێ کردوویەتی، جا بزانە چی پێ ئەکەم؟!.. یەعنی من زەمی تۆم کردبێ؟؟؟ هەی خەجاڵەت بێ یاخوا، ئا ئا، کەسیش نا تۆ؟

گێلاس: وەڵا ئیتر بڵێم چی نارەوەن خان، توخوا عەفومکە زۆر دڵگران بووم بۆیە تووڕە بووم، دەی وا بەڕێ و جێ قسەکانی ئەکرد، باوەڕم پێی کرد.

نارەوەن: گێلاس خان گیان ئێمە دراوسێ و خوشکی یەکین، عەیبە بۆ تۆ چۆن ئەبێ بە قسەی ناحەز، موو بکەوێتە بەینمانەوە.. توخوا زوو بەرەو ڕومان بکەوە.

گێلاس: نا نا هەر وازی لێبێنە، بەخوا هەر بەو قسانەت خەجاڵەت بووم، چۆن شتی وا ئەکەم.

نارەوەن: سا بەخوا تۆش نەیکەی، تەلەفونی بۆ ئەکەم، ئەوەی پێ ئەکەم، با بە دەواری شڕی نەکردبێ.

گێلاس: نا توخوا نا، لەبەر خاتری من شتی وا مەکە، هەر وا بزانە هیچ نەبووە.. من ئەبێ بڕۆم نارەوان خان گیان.. ئێستا ئاکۆ دێتەوەو با کەس بەمە نەزانێ.. توخوا ئەو تەلەفونەش مەکە با نەڵێن قسە ئەبات و ئەهێنێ.

(( یەکتر ماچ ئەکەن و خواحافیزیی.. گێلاس ئەڕوا، نارەوەن لە دەرگا ئەوەستێ.. لە خۆشیا کەمێک زمان دەرئەهێنێ و پێئەکەنێ))

ـــــ تابع ـــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٠٧ – متبوع- ڕ- دەمەو ئێوارە/ د - پشتی دەرگای ماڵی دارەوان:

((لە میوتیدا نارەوەن بە گورج و گۆڵیی دەرگا دائەخات و بەرەو ناوەوە دێت))

——— تابع ——————————— Cut ———————————

دیمەنی – ١٠٨ – متبوع – ڕ/ دەمەو ئێوارە/ ن – ماڵی دارەوان:

(( تیرۆژ لە هۆڵەکەدا خەریکی مۆبایلەکەیەتی.. نارەوەن بە پەلە دێتە ژوورەوەو دەست ئەداتە مۆبایلەکەی))

تیرۆژ: یاڵڵا خێر؟!

نارەوەن: تۆ هەقت نەبێ! (( بە مۆبایل ژمارەیەک لێ ئەدات و کە ژمارەکە وەرئەگرێ)) چۆنی ناسکە خان گیان باشی شوکور؟ ...... ئەرێ بە گلەیی نەبێ ناسکە خان گیان، بۆ ئەو قسانەت بۆ گێلاس گێڕابووەوە؟.................... دەی بۆ خۆشەویستی تۆ، من ویستم بزانی خەڵک چۆنتت باس ئەکەن، نەک بۆ ئەوەی بۆ خۆی بگێڕیتەوە (( تیرۆژ پەستیی پێوە دەرئەکەوێ)) ......... ئەی تەبعەن دەمی ئەبێ بە تەڵەی تەقیو، خۆ درۆم بەدەمییەوە نەکردووە...... (( پێکەنین)) دەباشە هەر چاکت پێ کردبێ باشە هههههە..... خواحافیزت بێ خوات لەگەڵ.

تیرۆژ: ئەرێ دایاااااااا!

Cut

دیمەنی – ١٠٩ – خۆرئاوا بوون/ دەرەوە- گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٥ - :

(( زوبێر مۆبایلەکەی بەدەستەوە گرتووە، شێوەی دانیشتنەکەی گۆڕاوە.. زەنگی مۆبایل دێت و زوبێر بە خێرایی هەڵی ئەگرێت))

زوبێر: بەڵێ فەرموو.

# (( ئەڵقەی شەش))

دەنگ: ئێستا بروسک دێت بۆ لات.. ئەو جانتایەی دەستتی ئەدەیتێ و ئەیهێنێ بۆ ئێمە، دوای ئەوەی دڵنیابووین پارەکە تەواوە، ئیتر مل بشکێنن و زۆر بە خێرایی ئەم ناوچەیە جێبهێڵن.

زوبێر: باشە بەسەرچاو.

(( هەڵئەسێتە سەرپێ و لە دوورەوە بروسک ئەبینێت و دواتر ئەگاتە لای))

زوبێر: تۆ بروسکیت؟

بروسک: بەڵێ قوربان.

(( جانتاکەی ئەداتێ و بروسک ئەگەڕێتەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٠ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( لە میوتیدا چیمەن بەناو ژوورەکەدا دێت و ئەچێ، بە سووکیی مست لە ناو لەپی ئەم دەست و ئەو دەستی ئەدا.. زەنگی بۆ دێت، بە پەلە هەڵی ئەگرێت))

چیمەن: باوکە گیان !!!!!

Cut

دیمەنی – ١١١ – ش/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار لەسەر قەنەفە دانیشتووە، بە مۆبایل قسە ئەکا، حەمە خدر لەو کاتەدا دوو پاکەت جگەرەی بە دەستەوەیە، ئەیەوێ بێت بۆ لای ڕێشار، کە گوێی لە قسەکانی ئەبێت، خۆی دوائەخات))

ڕێشار: بەڵێ پاشا گیان..... بەڵێ هەر ئەو شەوە چووینە سەر بارەکان و ئەوەی خۆمان هێنا ........ نا نا بێخەمبە لەشوێنە ئەمینەکەی خۆیەتی.......... بەڵێ ........ بەڵێ...... بەسەرچاو وا ئەکەین، هەر بە ڕێگە کۆنەکەی خۆمان ، هیچ شکی لەسەر نییە. (( حەمە خدر دێتە ژوورەوەو ڕێشار بە تووڕەیی ئیشارەتی ئەکا بچێتە دەرەوە، خدر ئەچێتە دەرەوە))...... بەڵێ بەسەرچاو،......... نا دڵنیابە هیچ هەڵەیەک ڕوونادات....... مەمنونم.... مەمنونم، قوربانت بم، دەستت ماچ ئەکەم خوات لەگەڵ. (( دوای تەلەفونەکە، بە دەنگی بەرز)) ئا وەرە خدر، وەرە هەتیو (( خدر دێتە بەردەمی)) سەد جارم پێ وتووی کە زانیت تەلەفونم لەگەڵایە نەیەیتە ژوورەوە.

خدر: وەڵا گەورەم هەر نەشمزانی لەگەڵ کێ قسە ئەکەی.

ڕێشار: جا یەکجاریی بۆ نایەی گوێ بنێی بە مۆبایلەکەوە بزانی ئەڵێین چی.. (( بە تووڕەیی)) وتم کە تەنیا بووم و گوێت لەدەنگم بوو مەیە ژوورەوە، یەعنی تەلەفون ئەکەم.

خدر: ئەمرەکەی گەورەم، بەسەرچاو.

(( پاکەتەکانی بۆ دائەنێت و ئەویش پارەیەکی ئەداتێ))

Cut

دیمەنی – ١١٢ – ش/ن- ماڵی دارەوان:

**(( لێرەوە جلوبەرگی دەرەوەی بێستان و تافان ئەگۆڕڕێت بە جلوبەرگی مۆدێل و جوانتر لە جاران))**

(( تریفەو بێستان و نارەوەن دانیشتوون.. تیرۆژ ئاویان بۆ ئەهێنێ، دوای بەخێرهاتنێکیترو ئاو خواردنەوەیان.. تیرۆژ ئەچێتەوە دەرەوە.. نارەوەن پیرۆزبایی جلوبەرگی تازەو مجاملة کردن))

نارەوەن: ئەوە حەیفت نەکرد بێستان گیان لای دوژمنەکانی دارەوەن دامەزراوی؟

تریفە: توخوا لێیگەڕێ دایکە، چەند بە ئێوەی وت سەرە گوریسێکتان نەدایە دەستیەوە، ئەی چی بکا؟

بێستان: نارەوەن خان من هیچ پەیوەندیم بە ئیش و کارو مشتەری و شت هێنانەوە نییە.. من و تافانی ژنی هەندرێن کە لای خۆتان ئیش ئەکا، لە ژوورێکا سەرمان ناوە بە یەکەوەو تەداخولی هیچ شتێ ناکەین.

نارەوەن: بەخوا هەر پێم ناخۆش بوو بڵێم چی بە دەست خۆم نەبوو... ئەی چۆن بێ ئیش دانیشتوون و لێتان ئەگەڕێن؟ خۆ قسەی ئەملاولاتان لەگەڵ ناکەن؟

بێستان: نا نا خوا هەڵناگرێ لە یەکەمین ڕۆژەوە کاک ڕێشار پێی ڕاگەیاندن کەس بێزارمان نەکا، بەخوا هەڕەشەشی لێکردن.. ئێستا من موچەی کارمەندەکانیان ئەدەم و تافانیش (( دەست ئەگرێ بە دەمیەوە پێ ئەکەنێ)) موبەریدەیەکی شکاو و زۆپایەکی بێ کەڵکی تۆمار کردووە.. لە گەنجینەیە.

نارەوەن: جا ئەبێ موچەی چەند کارمەند بێ؟ خۆ دارەوان و زوبێر ٤ کەسیان لایە.

تریفە: ئۆهـ دایکە دە بهێڵە قسەیەکی خۆش بکەین، من ئەمڕۆ ئۆفەکەم بوو هەر لەگەڵ بێستان بووم.. وتم با سەرێکی تۆش بدەین.

نارەوەن: تۆ بێدەنگ بە هەقت نەبێ، ئێ بێستان گیان!

بێستان: وەڵا ئەمان ١٢ کەسیان لایە، بەڵام بەخوا هەر ناویانم بینیوە، نازانم خۆیان کێن نایانناسم.

نارەوەن (( سەر ئەلەقێنێ )): ئێ ئێ ئێ... ئەی چەند سەعات لەوێ ئەبن؟

بێستان: ئێستا ئەڵێ.. بە دڵی خۆتان، هەرکاتێ ئەڕۆن و دێنەوە، گرنگ ئەوەیە پێکەوە بن، ئیتر هەر کاتێ پێتان خۆش بوو ئەوکاتە دێن و ئەگەڕێنەوە..

نارەوەن: ئای لەم دەوامە.. یەعنی چی؟

بێستان: وەڵا ئیتر ئاوایە، زۆر ئیسراحەتین.

نارەوەن: ئەخیری خێر بێ!

بێستان: ئەرێ من شتێک لە دڵما بووە بە گرێ توخوا بالێت بپرسم.

نارەوەن: فەرموو بێستان گیان.

بێستان: ئەوە لە تریفەشم پرسی باش نەیزانی.. باشە زانیمان تریفە شەوقی مانگەو تیرۆژیش ئەو تاڵە باریکانەیە کە چاوت کز بکەیت و سەیری مانگ بکەی ئەیبینی.. ئەی نارەوەن مانای چییە توخوا؟ ڕەنگە ئەویش خەرمانەی مانگ بێ! هههه

نارەوەن: بە کوردیی پەتیی بە داری زان ئەوترێ نارەوەن.. ئەوەی ئێستا هەموو پێی ئەڵێین داری زان. دارێکی زۆر گەورەو جوانە.

تریفە: ئەبێ لە چ ناوچەیەک وای پێ بڵێن؟

نارەوەن: ئەوەیان نازانم، بەس باوکی ڕەحمەتیم خوا عافویکا کاتی خۆی دیوانی شیعریی زۆر ئەخوێندەوە.. ڕوحم بە قوربانی بێ لای نالی و وەفایی و ئەدەب یەعنی مصباح الدیوان ئەوەی بینیوە، ئیتر ئاوا ناوی ناوم.. ئای توخوا هەموو جارێ بۆی ئەگێڕاینەوە. با بچم وێنەی دارەکەت بۆ بێم(( نارەوەن ئەچێتە ژوورێکیترو تیرۆژ شەربەت یان نیسکافە ئەهێنێت و پێکەنین لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ١١٣ – ش/د – ناو سەیارەی زوبێر:

(( زوبێر سەیارە لێئەخوڕێت و بروسکیش لە تەنیشتیەوە))

زوبێر: کێشەی من ئاسوودەیی کچەکەمە، نەک پارە.. ئەوە پەیا ئەبێتەوە.. کە دیار نەمای هەستم بە بێتاقەتیەکی زۆر کرد لەو کچەیا.. چوومە بن کلێشیەوەو هەرچۆن بوو دانی پیانا.. ئیتر بڕیارمدا بە دواتا بگەڕێم.. هەر کە تەلەفونیشیان بۆ کردم، ڕاستەوخۆ بەدەم ئیشەکەوە چووم.

بروسک: باشە ئەوان بە چییا زانین تۆ گرنگیی بە من ئەدەی؟ خۆ لای کەس باست نەکردووە.. ئەم بابەتە تایبەتە، بۆ هەمووماان.

زوبێر (( سەیارەکە ڕائەگرێ و تەماشای زوبێر ئەکا)): هەی ئافەرین!!!

بروسک: ئەی وا نییە؟ خۆ من و چیمەن نەک هەر بەوانمان نەوتووە، لای عیبادەل بەشەر باسمان نەکردووە.. بەڵام ئەوان هەموو شتێکیان لە بارەی منەوە ئەزانی، هەرچەند زۆر تەواو نەبوو.. گرنگ ئەوەیە شتێکیان لێ ئەزانی.

زوبێر: وەک چی؟

بروسک: بێ ئەدەبییە لە ڕووتا گەورەم، ناتوانم بیڵێم.

زوبێر: ئەو گەورەمە تەرککەو قسەکەش بکە، مەترسە لای چیمەن نایگێڕمەوە.

بروسک: چەند ساڵێک پێش ئێستا پەیوەندیم لەگەڵ کچێکی چاوسەوزا هەبوو.

زوبێر: ڕاست بڕۆ.. پەیوەندییەکە ماوە؟

بروسک: نەبەخوا، ئەو هەر شوشی کردووەو نازانم لە چ شارێکیشە.. باسی ئەوەیان کرد کە گوایە بێمە داوای چیمەن، برای ئەو کچە ئەمکوژن.

زوبێر: سەیرە.. بە کوردییەکەی خۆمان یەعنی تۆ سەر بەگۆبەنی!

بروسک: نەبەخوا گەو... کاک زوبێر، بە ژیانم کێشەم لەگەڵ کەسیشدا نەبووە، مەگەر بە منداڵیی.

زوبێر: زۆر باشە ئەگەر وابێ.. ئەوە مانای وایە، نەک تۆ، هەر کەسێک لەگەڵ چیمەن بووایە ئەوان هەر ئەیانڕفاند.

بروسک: نازانم.

زوبێر: وتت دەمەچاویان هەڵپێکا بوو.. خۆ دەنگیان ئەناسیتەوە؟

بروسک: بەڵێ زۆر بە ئاسانیی.. جگە لەوەش زۆر سەرنجی جلەبەرگیانم ئەدا بۆ ئەوەی شتێکم بۆ بدۆزرێتەوە.. یەکێکیان کونی جگەرەیەک لە شەرواڵەکەیا بوو، ئا.. هەر ئەوەندە ئەبوو، گەورەتر نەبوو.

زوبێر: کەواتە یەکیان جگەرەکێشە.. چیتر؟

بروسک: ئەویتریان مۆبایلەکەی گالاکسی بوو، یەک دوو خاڵ بە بۆیەی شین بە کراسەکەیەوە بوو.. هەردووکیشیان کالەیان لە پێیا بوو.

زوبێر: ئەوانەم بۆ بنوسەو لای هیچ کەسێک باسی ئەم ڕفاندنەت مەکە، لەو بڕوایەدای دایک و باوکت زانیبێتیان؟

بروسک: نەوەڵا کاک زوبێر دایک و باوکم ئەوەندە لە خەمی منا نیین، جارێکیان خۆم لەو ڕێگەی ئەوروپایەدا، دوو هەفتەم پێچوو، کە هاتمەوە هەر نەشیان وت بەخێر بێیتەوە، وایانزانی چووبووم بۆ کەرەستەی مۆبایل. هههه

زوبێر: کەواتە ئیشی مۆبایل ئەکەی؟

بروسک: بەڵێ جاروبار خۆم ئەچم ئەیهێنم و مەوادی یەدەکیش ئەهێنم.

(( زوبێر خەیاڵ ئەیباتەوە))

_______گەڕانەوەی هەیە _____________ Cut _____________

**<u>فلاشباک:</u>**

دیمەنی – ١١٤ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان و زوبێر دانیشتوون.. زوبێر بێتاقەتە))

زوبێر: من بێتاقەتی چیمەنم ئەڕۆمەوە، سەرم گێژ ئەخوا، هیچ تەرکیزم نییە.

دارەوان: خوا نەیبڕێ خۆ منالّی تریشت هەن زوبێر، ئەوە بۆچی بۆ چیمەن ئاوات لێدێت؟ جارێکیتریش هەروا تێکچووی.

زوبێر: دارەوان، چیمەن دلّی لاوازە.. هەر زوو دکتۆر پێی وتین نابێ نە خەفەت بخوات و نە زۆر دلّیشی خۆش بێ، گومان ئەکرێ دلّتەنگیی بیکوژێ، تەواو هەناسەی سوار ئەبێ.. بلّێم چی بەخوا لەوەوە لە هەردوو کوڕەکەم خۆشتر ئەوێ.. جگە لەوەش ئەو جێی نەهێشتم کە دایکی ڕۆشت، کەچی هەتیوە خوێڕیەکەم دوای کەوت.

دارەوان: ئۆو بە داخەوە، کەواتە ناهەقت نییە برا. نابێ بهێلّن توشی شۆک بێ.

زوبێر: ئۆو شۆکی چی؟ یەکسەر ئەیکوژێ، مەگەر هەر خوا بیداتەوە.

ـــــــ فلاشباک تەواو ـــــــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١١٥ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١١٣ - :

بروسک: باش خەیاڵت ڕۆشت؟!

زوبێر: بەڵێ بیرم لای شتێک بوو، بەڵام بۆ لەم کاتەیا؟

(( بیرکردنەوەی زوبێر.. دەنگی ئەم دایالۆگەی هەندرێن لە دیمەنی ٤٠ میکس بکرێ هەندرێن (( بە دەنگ )):

(( بەڵێ گەورەم، ئیشەڵڵا درۆت لەگەڵ ناکەم، خۆی وتی بگەڕێوە.))

زوبێر: کوڕم یەک ئامۆژگاریت ئەکەم، تا ماوی لە بیری نەکەی، وەک ئەڵێن، وەک ئەڵقە بیکەرە گوێت.

بروسک: فەرموو کاک زوبێر گیان.

زوبێر: هیچ قسەیەک لە ژیانی خۆتا بە زایە مەدە، واتە هەرچی ئەڵێی تا ماوی لەبیرت بێ، هەر کەسیش قسەی بۆ کردی هەموو قسەکانی هەڵگرەوە.. ڕۆژێک دێت کەڵک لە هەردووکیان وەربگری.

بروسک: جا چۆن ئەو هەموو قسەیە لە مێشکما جێی ئەبێتەوە؟

زوبێر: وەک فەرمانگەکان بکە، ئەوان دوای پانزە ساڵ، نوسراوە ئاساییەکان ئەفەوتێنن، بە کەڵکەکانیش بۆ ئەرشیف.. با لای تۆ هیچ نەبێ تازەکان بمێننەوە.

(( دەست ئەکاتەوە بە لێخوڕینی سەیارەکە))

Cut

دیمەنی – ١١٦ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( کلێپەو باڵا لەسەر قەنەفەکان خەوتوون.. هەندرێن و تافان دانیشتوون))

هەندرێن: ئەهـ ، وەڵا بابە تەواومان کرد، من لە ئیشەکەی تۆ بە گومانم، کەچی تۆ ئەڵێی داوای تۆش ئەکەن؟ ئەڵێن نابێ لای زوبێرو دارەوان ئیش بکا؟

تافان: دڵ پیس مەکەو گومانت بۆ هیچ نەچێ، من تۆ بە هەموو پیاوی سەر زەوی ناگۆڕمەوە، جا کە داوای تۆش ئەکەن، مانای وایە ئەسڵەن ئیشیان بە من و بێستان هەر نییە.. تۆش دێیت و بە دیارمانەوە ئەبی، چەند باشە؟

هەندرێن: بەساقە من پێیان مورتاح نیم، ئەوانە خەڵکی شەقوەشێن و سەرانە وەرگرن، من تاقەتی ئەو جۆرە دەموچاوانەم نییە، نەبەخوا.

تافان: دەی کەواتە پێت خۆشە لە ئیشەکە دەرکرێم..

هەندرێن: بۆ؟ تۆ بۆ دەرئەکرێی؟

تافان: ئەی هەر بە ئاشکرا وتیان چۆن ئەبێ یەکێک لەم کۆمپانیایە کار بکات و مێردەکەی لای دوژمنەکانی بێ؟

باڵا: ئەرێ دەتوخوا بێدەنگ بن، خەومان یەت بەیانی زوو هەڵئەسین.

کلێپە: وەڵا ڕاست ئەکا هەر ناهێڵن بخەوین.

(( هەندرێن و تافان پێ ئەکەنن))

تافان: ئەوە خۆ دوو ئافاتەکە نەخەوتوون.

هەندرێن: هەستن هەستن بۆ جێی خۆتان.. دەی درەنگە، ئیتر ئێمەش خەومان دێت، وا نیوەشەوە.

Cut

دیمەنی – ١١٧ – ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( دەوران کچێکی ٢٥- ٢٧ ساڵان، دەوڵەمەند، جلوبەرگی ڕاقی، قژ خاوی قژ درێژ، ئەتەکێتی پێوە دیارە، چاوەڕوانی شەنیایەو سەرقاڵی مۆبایلە، پاش کەمێک شەنیا دێت. سڵاوی هاکەزایی و وەڵام))

دەوران: ئەمە کەی شوێنە منت بۆ هێناوە؟

شەنیا: شوێنەکەم مەبەست نییە.. هەڵبەت ئیشێکم بە کەسەکانی شوێنەکە هەیە.

دەوران: کوا هیچ نابینم؟

شەنیا(( پێکەنین)): دیارە چاو بۆ کوڕێکی جوان ئەگێڕی؟!

دەوران: ئەی ئیشت بە کێیتر هەیە؟

شەنیا: ئاوڕێک لە کاشێرەکە بدەرەوە.

دەوران(( ئاوڕ ئەداتەوە)): عەیبی نییە، کەمێ داماو دیارە.

شەنیا: مێردێکی هەیە سوودی لێ ئەبینم، بەڵام ئەم ناهێڵێ، هیچ کچێک لێی نزیک بێتەوە.

دەوران: ئێ دەستی خۆش بێ.. بۆ ئەوەش بووە بە کەموکووڕیی؟

شەنیا: دەوران تۆ زۆر ڕەقیت.. من پێویستیم بە تێکەڵاویی هەموو جۆرە کەسێکە، ئەمەوێ دەستم بگاتە گەنجینەیەکی پڕ لە زێڕ، تۆش هەموو هەستان و دانیشتنێکی منت بەلاوە سەیرە.

دەوران: هەر بەڕاست هەڵسوکەوتت لەم ماوەیەدا سەیرن.. خۆ دەوڵەمەند کردن ڕێگەی خۆی هەیە شەنیا گیان.. چاو لە من مەکە، من ئەگەر نیگاری دایکم نەبووایەو ئەو کارگەیەی بۆ نەکردمایەتەوە، ئێستا بۆ پارەی چایەک پەکم ئەکەوت، خوا نەیبڕێ، باش نییە تۆ باوکەکەت هەیەو ئاگای لێتە؟ من کێ؟ هەیەو نییە قەلەو قوتێ! من و نیگارو بەس.

شەنیا: دەوران گیان، نیگاری دایکت سەد باوک ئەهێنێ.. شەڵڵا منیش باوکم نەبووایەو دایکێکی وام هەبووایە.. بەڵام ڕۆڵە زروفی هەر یەکێکمان جیاوازە.. ئیتر ئێستا ئەوەی هەیە ناکرێ بیگۆڕین.. کەواتە من خۆم ئەبێ چارەسەرێک بدۆزمەوە دەست بۆ باوکم پان نەکەمەوە.

دەوران: وا بە ئاسانیی؟

شەنیا: بەڵێ.. من لە ڕێگەی ئەو ژنەوە دێمە ئەم قاوەخانەیەوە بە ناوی ئیشەوە.. لە مێردە چاوبزەکەی نزیک ئەبمەوەو بە کورتیی دایئەدۆشم.

دەوران: چەند پیسییت کچێ؟! بۆ ژیانیان ئەشێوێنیت؟

شەنیا: بێ ئەقڵ خەیاڵت بە لایەکا نەڕوا، خۆ حەزی لێ ناکەم، تەنها خۆمی لێ نزیک ئەکەمەوە.. ڕێگەیتر زۆرە، بەڵام گەر خۆم لێی نزیک ببمەوە، ئەم چەتیوە کێشەمان بۆ دروست ئەکا.

دەوران: ئێ باشە بۆ هەر ئەبێ لێی نزیک بکەویتەوە؟ بۆ وا گەڕت تێ ئاڵاندوون؟

شەنیا: کابرایەکی گێلەو هەر کچێ بزەیەکی بۆ بکا، ئەو پارەی بۆ هەڵئەڕێژێ.. منیش تەماعم لە پارەیەکی قەبەدا هەیەو ئەمەوێ بە ناوی پرۆژەیەکەوە لێی بکێشمەوەو بگەمە مەرامی خۆم.

دەوران: شەنیا مەکە.. بەڕاستی من ناتوانم درێژە بە هاوڕێیەتیمان بدەم، گەر وا بکەی.. من ناهێڵم لە هیچ شتێک پەکت بکەوێ، باوەڕم پێ بکە، داوای پارەی گەورەم لێ بکە، بۆت دابین ئەکەم، بەو مەرجەی بەو جوانییانەی خۆتەوە بمێنیتەوەو نەکەویتە دەریای بۆگەنییەوە.

شەنیا: تەنها ئەم تاقیکردنەوەیەو بەس.

دەوران: بڕوام پێ بکە، ئەوەندەی مەرامێکت گەیشتە ئەنجام و شتێکت دەستکەوت، ئەوکاتە ئەکەویتە گێژەنێکەوە خۆت نەزانی چۆن ئەتهێنێ و ئەتبا.. هەر ئەوەندەی نیازت لا دروست بوو بۆ خراپە، ئیتر ئیرادەت تێک ئەشکێنێ.

شەنیا: کە شتێکی پیسی؟! ئەهـ ... خەریکە ساردمکەیتەوە.

دەوران: ئەوەت باشترە لە کێشەو شەڕەشەق و سەرێشە.. واز بێنە کچێ.. من پشتگیرتم تا تۆ هەبیت.. وەرە لای من ئیش بکە.

شەنیا: من حەزم لە ئیشی ئاسایی نییەو ناتوانم یەک سەعات بۆ مووچە دەوامی هیچ شوێنێ بکەم.

دەوران: هیچیش مەخۆو هەستە با بڕۆین، من بە شوێنەکەو بە قسەکانت دڵم تەنگ بووە (( هەڵئەسێ و شەنیاش بە نابەدڵیی دوای ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١١٨ –ڕ– نیوەڕۆ/د – بەر کۆمپانیای ڕێشار:

(( خدر کە بەردەوام لەگەڵ پاڵنانی عەرەبانەکەیدا خەڵک وریا ئەکاتەوەو بە دەنگی بەرز ئەڵێ – وریابن، خۆتان لادەن با بەرنەکەون، خۆتان لادەن با چەور نەبن و بەوشێوەیە.. عەرەبانەکەی بەر شەرواڵی کەسێک ئەکەوێت و لای خوارەوە لە شەرواڵەکەی ئەدڕێت))

کەس(( تووڕە)): ئەوە کوێراییت داهاتووە گوێرەکە؟

خدر(( بەرگری لە خۆکردن)): جنێو مەدە کاکە، دەجارم وت ئاگات لە خۆت بێ، بەڵام تۆ حسابت بۆ نەکردو بەر قاچت کەوت، هیچ نەبووە چاوەکەم، چارەسەری ئەکەین.

کەس: چارەسەری چی ئەکەی کوڕی سەگ؟ دڕاو لێ بووەوە.

خدر: وتم جنێو مەدە.

کەس: جنێو ئەدەم و هەردوو چاویشت دەرئەهێنم، ماکەر. (( دێتە نزیکی خدرەوە)) یەک ڕانک و چۆغەی تازەم لەم ڕەنگە بۆ ئەکڕیتەوە.

(( ڕێشار بەرەو دەرەوە دێت و لەناو دەرگای کۆمپانیا ئەوەستێ، سەرە ئەیەوێت بچێتە پێشەوە لە خدر، ڕێشار دەست بە سنگی سەرەوە ئەگرێت و ناهێڵێ))

خدر: جا خۆ ئەمڕۆ هەرچیم پەیا کردووە قاتێکی تۆی تیا نابێ، مەردی خوا بە با لای بەرگدروویەک بیدورینەوەو ڕزگارم بێ.(( کابرا دەست هەڵئەهێنێتەوە لێی بدا)) دەست هەڵمەهێنەرەوە، تاقەتی شەڕوبەزمم نییە براکەم، ئەو هەموو جنێوەشت پێدام گەردنت ئازابێ.

(( کابرا ئەیەوێ لێی بدا، خدر بە یەک دوو جوڵەی جۆدۆ کاراتیی ڕێی لێ ئەگرێت و خەریکە دەستی بشکێنێتەوە.. لە پڕێکدا وەک ئەوەی کە نابێ ئەوە بەکار بهێنێ، پەشیمان ئەبێتەوەو بواری کابرا ئەدا یەک دوو بۆکسی لێ ئەدا.. ڕێشار کە ئەوە ئەبینێت خۆی دێتە پێشەوەو چەند بۆکس و شەق و زللەیەک لە کابرا ئەدات و سەرەو ماڵەش دێن، کابرا ڕا ئەکا))

ڕێشار: بە دڵت بوو حمە خدر؟

خدر: گەورەم بێنە دەستت ماچ بکەم ئەرکت کێشا، خەجاڵەتم.

ڕێشار: ناوەڵا هیچ خەجاڵەت مەبە، دەرفەتێکی باش بوو، دەمێک بوو حەزم ئەکرد هەندێ شەق و بۆکس بوەشێنم، باش بوو ئەم کابرایە پەیا بوو.. ئەگینا ڕەنگە بەر خۆت کەوتایە هاهاها.

خدر: منیش لە خزمەتدام گەورەم.. کەواتە دەستت خۆش بێ.

کرمانج: ماندوو نەبی کاکە ڕێشار گیان، دەستت خۆش بێ باشت کوتا.

مالە: جا تۆ شەڕی دەستەویەخەی کاک ڕێشارت نەبینیوە، یان شەڕە دەمانچەی، ئەوە ببینی ئەڵێی چی؟

Cut

دیمەنی – ١١٩ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان چیپە بۆ هاوڕێ ئەکا ))

ئەردەڵان: ئاخر بۆیە پێت ئەڵێم تا ئاگات لە خۆت بێ، ئەگەر ئەتبینی کاک ڕێشار چۆن کابرای دایە بەرشەق و کێبڵ، ئەوسا ئەتزانی چۆن بەرگریی لە حمە خدر ئەکرد، بەخوا لە پیاوەکانی خۆی زیاتر.

هاوڕێ: جا ئەم کێبڵە لە کوێوە پەیا بوو؟

ئەردەڵان: نازانم، سەرەو مالە یەکێکیان بۆیان هێنا.. ئیتر وریا بە من لەبەر تۆمە براکەم، هیچ متمانەی پێ نەکەی.. بەخوا لەمەولا هیچ لاریم نییە ئەگەر بارێکیش هەبوو، بڵێم کاک حمە خدر تۆ بیبە.. نەوەڵا باوکم من تەحەمولی ئەو هەموو شەقە ناکەم، ئەمرم.

هاوڕێ: کورە وا نییە خوا ئەزانێ بۆ خۆی لێیداوە، خۆت مەتۆقێنە.. جا وا پیاوی کاک ڕێشاریش بوو، خۆ نابێ بە کەڵەگای گوزەرەکە.

ئەردەڵان: بەرەوەڵا ئەوە ڕێک بۆ ترساندنی من بوو، یەعنی ئەگەر هەر کەسێک قسە لە قسەی حمەخدرا بکا، وای لێ ئەکەم.. تۆ ئاگات لەچییە؟

Cut

دیمەنی – ١٢٠ – ڕ / ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان.. کڵپەو باڵا یاری یان سەعی ئەکەن))

هەندرێن: ئەرێ ژنەکە بە ڕۆژێ چی ئەبێ؟ من هەندێ پارەم لای مامۆستا ماوە، نابێ پاکیکەینەوە؟

تافان: تۆ خاوە خاو ئەکەی، خۆ ئەزانم ئیشی لای ئێمەت بەدڵ نییە، سابەو خوایە بەیانی یەکلای نەکەیتەوە، تەواو عاجز ئەبم.. ئیتر کەیفی خۆتە.

هەندرێن: باشە باش، بهێڵە باش بیر بکەمەوە لە ڕایی خوا.

باڵا: ئەوە تۆ بۆوا لە باوکم ئەکەی؟

تافان(( سوعبەت)): چیم لێکردووە؟ خۆ دارکاریم نەکردووە پشقل!

کڵپە: ئینجا سەرودڵی ئەگری، ئاگامان لێتانە.

هەندرێن: بێدەنگ بن مناڵ! وا هەڕەشەی دارکاریش ئەکا.

Cut

دیمەنی – ١٢١ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار خەریکی خواردنەوەیەو کرمانج و سەرەو مالەو ڕەحمان، خزمەتی ئەکەن.. ڕەحمان مریشکێک بە ڕازاوەیی ئەهێنێت و لەسەر مێز یان تەپڵەکی بەردەمی دایئەنێ))

ڕێشار: دەی باشە، منیش حەزم لێیەتی، ئەمشەو دەرئەچین و دەمەوبەیان ئەگەڕێینەوە.

کرمانج: گەورەم حەددی ئەوەشم نییە بەڵام مەچۆ سەر قسەی کوڕوکاڵەکان، با توشی سەرێشەیەکیش نەبین، ڕاو قەدەغە کراوە.

ڕێشار: ئەگەر تۆ ئەترسی مەیە کرمانج (( پێکەنینی هەموو ڕەحمان و کرمانج نەبێ))

مالە(( بەدەم پێکەنینەوە)): کرمانج لە حوکمەت ئەترسێ هاهاها.

سەرە: کە حاڵت وایە کاکە بچۆ لەگەڵ حمە خدرا حەماڵیی بکە، ئەویش وەک خۆت وایە، دایمە ئەڵێ ئاخر ئەمانگرن هاهاها.

ڕێشار: سا وەڵڵا لە هەندێ شتا حمەخدر ئازاترو وریاترە هاهاها.

سەرە: جا گەورەم با ئیشەکانیان بگۆڕنەوە.

مالە: زوو پێموت، ڕەتی کردەوە، وتی ئەوەی بە ئێوە ئەکرێ بە من ناکرێ، ئیشەکەی خۆم عەیبی نییە.

کرمانج: باوەڕ بکەن مەبەستم ترس و شتی وا نییە، بەڵام ئەڵێم ڕەنگە حیکمەتێک لە قەدەغە کردنەکەیا هەبێ.. ئەگینا ئەوە هاتووم و هەموو حوکمەت ڕێگریییمان بکات، باکم نییە، تا ئەکوژرێم شەڕ ئەکەم.

ڕێشار: ئافەرین کرمانج، من ئەزانم تۆ کون لە جەرگتا نییە، بۆیە ڕێگەمداوە ئیشم لەگەڵ بکەی، ئازایەتیی لە چاوتا ئەبریسکێتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٢٢ – ش/ د – چایخانەی گەڕەک:

(( ئاکارو برزۆو شەماڵ و حمە تایەر، تەمەن نزیک و عەشایەرو هاوڕێن))

برزۆ: جا وەکو عەرزم کردن، من ئەگەر دەست بدەمە ئیشێکی وەکو ئەوەی زایەری برات چۆن ئەهێڵم بەوجۆرە بێ، ئەو ئیشانە زۆر گرنگن عینسان ئەبێ زۆر وریابێ.

شەماڵ(( گاڵتەپێهاتن)): کورە قەسابییە قەسابیی، گرنگی چی و تەڕەماشی چی؟ خۆ من هەر ئەو تۆزەش لە قسەکانت تێگەیشتم، تۆ ئەتەوێ وەک تەلەفیزۆنەکان قسە بکەیت، ئیتر نازانم ئەوانیش هەروەک تۆ قسە ئەکەن و کەس تێیان ناگا، یا باشترن؟

ئاکار: یەعنی بەراوردت بۆ ناکرێ؟

شەماڵ: کورە نەبەخوا، کە ئەوان قسە ئەکەن من کەناڵەکە ئەگۆڕم و کە ئەمیش قسە ئەکا خۆم بە شتێکیترەوە ئەخافڵێنم.

برزۆ: من قسە بۆ تۆ ناکەم با بزانی، قسە بۆ حمەتایەرو ئاکار ئەکەم.

تایەر: ئەگەر قسە بۆ من ئەکەن، چارەسەرێکم بۆ بدۆزنەوە، چۆن بتوانم فرسەتێ لەو چەتیوە بقۆزمەوەو بە تەنیا دوو قسەی لەگەڵ بکەم.. لای زانکۆکەیان پۆلیس و لایماڵیشەوە براکانی و خەڵکی گەڕەک.

ئاکار: بە قسەی من ئەکەی پەلەی ئەوەت نەبێ.. جارێ با وای لێ بێ سەروسیمات تەواو بناسێتەوەو دەرخت بکا، ئەوسا جاروبار خەندەیەک و خۆدەرخستنێک و بایەخ پێدانێکی زۆر.. کە زانی بایەخی زۆر پێ ئەدەی خۆ بەشەرە بەشەر، ئەگەر لەگەڵ کەسا پەیوەندیی نەبێت، ئەو بایەخەت بە هەند وەرئەگرێ.

شەماڵ: ئەو هەموو هاتوچوونەی بۆ چییە بابە؟ بە قسەی من بکە، لێی بچۆرە پێشەوەو نیەتی دڵی خۆتی پێ بڵێ، ڕازی بوو ڕازی بوو، ڕازی نەبوو. هەردوو چاوی دەرئەهات، ئەم نا ئەو.

تایەر: ئاخر من ناتوانم بیبینم، خۆ لەبەرچاوی براکانیشی قسەی لەگەڵ ناکەم، لە زانکۆکەش ئەو ناوە ئەوەندە قەرەباڵغ ئەبێ، کەڵکی هیچی نییەو پۆلیسیش لەولاوە بوەستێ.

شەماڵ: جا ئەوە چییە؟ چارەسەری زۆر ئاسانە.

تایەر: توخوا؟ ئادەی بەساقەوبم.

شەماڵ: هەر ئێستا وات بۆ چارەسەر ئەکەم، بەیانی بە ئارەزووی دڵی خۆت قسەی لەگەڵ بکەیت.

تایەر: دەی قوربانت (( ئەچێتە تتەنیشتیەوەو بە جدی گوێ ڕائەگرێ))

Cut

دیمەنی – ١٢٣ – ش/ن – ماڵی حمەخدر:

((شوقەیەکە لە ژوورێکیدا هیچی تیا نییە تەنها زۆپایەکی کۆن و جێی خدر نەبێت کە ڕاخراوە.. عەلاگەی جلی تەختەی بچوک بە دیوارەکەوە داکوتراوە.. بوتڵێکی غازە بچوکەکان هەیە.. قۆری و پیاڵە لە سوجگیەکدا.. نایلۆنی نان و سفرەیەکی بچکۆلە.. دەبەیەکی پێنج لیتریی بۆ ئاو، پەرداخێکی ستیل یان فافۆن.. مۆبایلی بەشەحنەوەیە.. مەنجەڵێلکی بچوک، دوو قاپ.. لە سەبەتەیەکیشدا چەند پیازو هێلکەیەک، چەقۆو کەوچکێک و پلاستیکێک بۆ پیاز جنین، دەبەیەکی زەیتی نیوەش بە تەنیشتیەوە.. خدر لە نزیکی بوتڵە بچوکەکەوە دانیشتووەو هێلکە سوور ئەکاتەوە.. پیازی بۆ ئەجنێت و نان لە نایلۆنی نانەکە دەرئەهێنێت و ئەیخوا))

خدر(( لەبەرخۆیەوە، بەدەم نان خواردنەوە.. یان بکرێ بە مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە)): هەرچی دەم ئەکاتەوە ئەڵێ بۆ ژن ناهێنیێ؟ هههە بەخوا ناهەقیشیان نییە هههە ئاخر ئەم سەڵتیی و زوگورتێتییە لە کوێ و ئێستا ژنێک چێشتێکی چەوری بۆ لێبنامایە لە کوێ؟ .. دەی جارێ کاتی نییە، کنگرو ماست بە وادەی خۆی حمەخدر، پەلەت چییە؟ هەمووی دوو سێ مانگە دەستت بەم ئیشە کردووە، بزانە ئەیگەیەنیتە کوێ.. جارێ وا لەتاوا ناوی خۆشم بیرچۆتەوە نەک ژن هههە.

Cut

دیمەنی – ١٢٤ – ش/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( کرێکارو تریفە خەریکی پاککردنەوەو کورسی هەڵگرتنن، هەڵشۆ دێت))

تریفە(( گرژ)): ئەرێ دە وەرە یارمەتییەکمانبە، پشتم شکا.

هەڵشۆ: ئەوە کێشەی خۆتە.. خۆت ڕازیت بەوحاڵە.. ئەگینا یەکێکمان ئەهێناو تۆش ئەوەندە ماندوو نەئەبوویت.

تریفە: ئای!!! تۆ کچێکت ئەوێ بۆ چاوچاوێن و چاوباشقاڵیی.

هەڵشۆ: ئەی بۆ پیاوێکت بۆ نەهێنم، با چاوباشقاڵییەکەش هەر بۆ خۆت بێ.

تریفە: پفففف حەددت نەبێ من لەوجۆرە ژنانە نیم.. وەرە دەی خۆت مەدزەرەوە.

هەڵشۆ(( هاوکاریی ئەکا)): با پێت بڵێم، مشوورێکی خۆت بخۆ، من ئیتر چوارشەممولنیش ناتوانم لە بری تۆ لێرە بم.

تریفە(( بەرەنگار بوونەوە)): ئەی توخوا شەوان بۆ دێیت، بۆ کۆکردنەوەی پارەکە؟ بابە ئەویشم ناوێ، واز لێرە بێنەو بە تەڕو وشکییەوە خۆم بەڕێوەی ئەبەم.. ئا ئا ئا!!!

هەڵشۆ: هەر زۆر باشە شەوانیش نایەمەوە بەدواتا، خۆت چۆن دێیتەوە وەرەوە.

تریفە: ئەرێ من دوو دەقە تۆم نەبینی و کێشەیەک دروست نەکەیت.. ئەگەر منت ناوێ و چاوت لە شوینیترە؟ بڕۆ باوکەم حاشا لە دیارت، وەڵڵاهی ممنونیشت ئەبم.

هەڵشۆ: تۆی سەری زمان و بنی زمانت کێشە خوڵقاندنە، ئەوە من نییم.. من ماڵ و ژنی خۆم ئەوێ، دیارە تۆ چاوت لە جێی ترە.

تریفە(( دەستێ بەرز ئەکاتەوە بۆلای سەری وەک ئاماژەی بێزاریی)): ئۆوهۆۆۆۆ! جا خەڕەکە.

Cut

دیمەنی – ١٢٥ – ش/ د – دەش و دەر:

(( دیمەنی ڕاوکردن.. دایالۆگ لە بواری ڕاودا سەربەستە.. ڕێشارو کرمانج و سەرەو ماڵە.. بۆ نمونە کەروێشکێک دیارەو ئەمان چاوەڕوانی دەست و نیشانی ڕێشارن و ئەویش نیشانەی لێ ئەگرێ و تەقەو بەر نەکەوتنی کەروێشکەکە.. بە دەستی بەتاڵ ئەگەڕێنەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٢٦ – ڕ/ ن – ژووریکیتری کۆمپانیای زوبێر:

(( ڕێژوان بە مۆبایل لەگەڵ سەلوا)) ١- کە مادام وای لێهات سێ خانوو جۆر ئەکەین، یەکیان بۆ دایکم و یەکیان بۆ باوکت و خۆشمان لە بەینیانا هەبە...... ٢- ئەوەش باشە، دواییش ئەیدەینە دەست گەورەکانەوە ئەوان ڕێگەیەکمان بۆ دانێن ....... ٣- ئەمرکە....... ٤- دوو سێ جارم پێوتی لەبەر تۆ وازم لەو نەهێناوە.. من ٧ساڵی ڕەبەقە ئەو کچە ئەناسم، ٣ ساڵە بەحساب ڕازی بووە، تا ئێستاش ڕازی بوونەکەی، وەک ئەوە وایە بە زۆر ڕازیم کردبێ، بەردەوام بێدەنگ و وەڵامی هیچ شتێکم ناداتەوە، ئاخر ئەوە کەی خۆشەویستییە؟ وەک ئەوە وایە ٧ ساڵ بێ لاپتۆپێکی سوتاوم هەبێ، ئیتر بە ڕاستی تاقەتم چوو...... ٥- نا من دڵنیام گوناح نییەو هیچ دڵیشی بە منەوە نییە، دیارە هی خۆی هەیە، ئیتر منی بۆچییە؟ توخوا ببورە سەلوا گیان جارێکیتر ئەو باسە مەکەرەوە زۆر بێتاقەت بووم، ئەوەتا تاقەتی قسەشم نەما، کاتێکیتر قسە ئەکەینەوە...... ٦- باشە ئێستا ئەڕۆم با باوکم ئاوا نەمبینێ...... ٧- بەڵێ باشەو لێرەیە.. لەسەر ئیزنی تۆ... ٨- تۆش ئاگات لە خۆت بێ.. بای.

Cut

دیمەنی – ١٢٧ ڕ/ د – خەستەخانە:

(( سەلوا لە دەرەوەی قاوشەکان لەگەڵ ڕێژوان بە مۆبایل)) ١- نا، وا نابێ.. ئەبێ هەردوولا تێکەڵکەین لە خانووەیەکداو خۆشمان لە قاتی سەرەوە...... ٢- ئەک ئافەرین، خۆت گیان زۆر ئاقڵی، بەس من دوودڵم لەشتێک ......... ٣- ئەڵێم تۆ بڵێی ئەو کچەی لەبەر من وازت لێهێناوە ئاسایی وەریگرێت، باوەڕ بکە بەزەییم پیایا دێتەوە..... ٤- ڕاست ئەکەی تێگەیشتم، بەس ئەترسم هێشتا دڵی بە تۆوە بێ، گوناحە...... ٥- ببورە ئازیزم.. باشە ئیتر ئەو باسە ناکەینەوە، خۆت بێتاقەت مەکە، باش؟ ..... ٦- ئۆخەی شوکور باش بووە؟ هاتووەتەوە بۆ کۆمپانیا؟...... ٧- باشە بای بەقوربان ئاگات لە خۆت بێ...... ٨- بای!

(( سەلوا مۆبایلەکەی هەڵئەگرێتەوەو ئەچێتەوە بۆ ناو قاوشەکان))

Cut

دیمەنی – ١٢٨ – ڕ/ د – بەردەگای ماڵی دارەوان:

(( ئاوا سەیارە ئەهێنێتە دەرەوەو تیرۆژو ئامۆ چاوەڕوانی ئەکەن.. نزیکی ئامۆ ئەبێتەوەو تێی ئەگەیەنێ کە دوو تایەی پەنچەرە))

ئاوا (( دائەبەزێت)): بۆ دوو تایە بە جارێ؟ سەیرە!

ئامۆ: ئەی نەئەبووایە چێکی بکەی ئەوسا بیهێنیتە دەرەوە؟

ئاوا ((وردە وردە بەرەو بەردەمی دەرگاکە ئەچێت و دیقەتی زەویی ئەدا)): ئۆو ئامۆ وەرە وەرە بیبینە چیان بۆ هەڵڕشتووین؟

ئامۆ: چیی هەڵڕژاوە؟

ئاوا (( کۆمەڵێک ئاسنی چوار سوچی کۆکردۆتەوە)): ئەها.. ئەمە بە مەبەست بۆمان دانراوە، ڕەنگە ویستبێتیان درەنگ بگەینە دوکان.

تیرۆژ ((دیقەتێکی ئەدات، لێو گەستنێک وەک ئەوەی بزانێ ئیشی تایەرە)): یەکێکتان ئەمگەیەننە زانکۆ؟

ئاوا: بە چی بتگەیەنین؟ خۆت بە تاکسیەک بڕۆ.

ئامۆ: واز لە سەیارەکە بێنە.. تۆ بە تەکسیەک بچۆ بۆ دوکان و منیش بە تەکسی تیرۆژ ئەگەیەنم.. نیوەڕۆ چارەسەریکە، با زۆر دوانەکەوین.

تیرۆژ: دەستخۆش کاکە وا باشترە.

(( هەرسێکیان لە میوتیدا دیالۆگ و ئەچن بەرەو سەری فەرعەکەیان))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١٢٩ – متبوع – ڕ/ د – سەرشەقامی گشتی:

(( سەیارەکەی تایەر لە سەرووی فەرعەکەی ئەوان وەستاوە.. کە ئەیانبینێ هەر سێکیان پێکەوەن، ئەڕوات.. تیرۆژ لەبەرخۆیەوە بزەیەکی کەم و دیقەتی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ١٣٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر/ژووری زوبێر:

(( زوبێر کۆمەڵێک ئەوراقی لە بەردەمدایە، خەریکی هەڵدانەوەو خوێندنەوەیەتی و ئاماژەی ئەوە ئەکات هیچی لێ تێناگات.. پاش کەمێک دارەوان دێتە ژوورەوە، پاش سڵاو و بەخێرهێنانەوەو هەواڵپرسینی تەندروستی زوبێر))

دارەوان: ئەوە کێشی تەواوی بارەکانە، بە پێی پسوڵەی ٣٧ ئەلفەکەی گومرگ تەواوەو هیچ عەیبی تیا نییە.

زوبێر: کێ ئەم جەردەی کردووە؟

دارەوان: ئەو کوڕە باشەکەی زۆر بە وریاو زیرەکت ئەزانی، هەندرێن.

زوبێر: وابێ بە کەڵکی ئێمە نایەت، پاڵی پێوەنێ.

دارەوان: وەڵا زوبێر گیان ئەو پاڵی بە ئێمەوەنا.. ئەم بەیانییە زۆر زوو هات و داوای هەق و حسابەکەی خۆی کرد، منیش دوا بە فلسم دایەو وتی خوا ئاگادارتان بێ ئیشم بە ئێوە نەما (( زوبێر وەک ئەوەی باوەڕی پێ نەکا تەماشای ئەکا)) تۆ بڵێ کێ دایمەزراندووە لای خۆی؟

زوبێر: کێ؟

دارەوان: دوژمنەکەمان.. ڕێشارە لوتسڕ.

زوبێر: دارەوان تۆ بۆ ئەوەندە حەز ئەکەی ڕێشار بە دوژمن بزانی.. کاکە ئەوە کاسبییەو ئەو خەڵکی لەگەڵایەو دەستی ئەڕواو ئەتوانێ بازاڕەکە قۆرخ بکا، خۆ من و تۆی داماو نییە.. ئینجا بۆ خەڵک چۆنە لەگەڵ ئێمەشا هەروایە، تکایە بە دوژمن ناوی مەهێنە با نەگاتەوە دەمی، تاقەتی بەزمی ئەومان نییە.

دارەوان:: توخوا بەوەش ئەڵێی کاسبی، ئەشهەدوبیللا سەرانەوەرگرتن و قۆڵبڕین و عەنتەریاتە.

زوبێر: دەی بڵێین چی؟ خوا پێیداوە.. بەس ئەم ئەوراقە زۆر تێکەڵ و پێکەڵە، من هیچی لێ تێ ناگەم ((فڕێی ئەداتەوە سەر مێزەکە))

دارەوان: تۆ جارێ باش نەبوویت، من باشی تێئەگەم و خێروبێریشی بەیانی و دووەی دەرئەکەوێ، بەڵام ئەمڕۆ بەشەکەی ئەو هەتیوەم لە قاصەکەیا بۆ داناوی، نەک بۆی بنێرێ.. توخوا کە هات با من نەیبینم.

زوبێر: دەی خۆ بەزۆر ناتهێنمە بەردەمی، ئەتوانی کە دەرکەوت تۆ بڕۆی.

دارەوان: زوبێر ئەمڕۆ بۆنی دەمت خۆش نییە، هیچ ڕوویداوە؟

زوبێر: نا دارەوان، چی ڕوویدابێ؟ خۆم کەمێک لەگەڵ کاردۆی کوڕم بە تەلەفون تێکچووین، وا قنگی گرتۆتەوە، هەر نایەتەوە.. ناچارم یەکێکیتر بێنم، گەر پێت خۆش بێ.

دارەوان: جا خەڵک هێنان من و تۆی بۆچییە زوبێر؟ کەی ئەوەنە عال و سال بووی بە قسەی منت کردووە؟ هههە کێ ئەهێنی بیهێنە، من هەر چواریەکم ئەکەوێ بیدەمێ، وەک بەشداریم لە کۆمپانیاکەش.

زوبێر: دەباشە، سبەی دوو سبەی خزمێکم هەیە شارەزایە لە جەردو شتی وا، ئەو ئەهێنم.

دارەوان: بەخێر بێت سەرچاو.. ئەگەر ئیشێکت بە من نییە، ئەچمەوە ژوورەکەی خۆم، نەک ئەو هەتیوە خۆی بێت.

زوبێر: باشە بڕۆ.

(( دارەوان ئەچێتە دەرەوەو ڕێشار بەرەو ڕووی دێت، دارەوان ئەیەوێ بڕوا، ڕێشار قۆڵی ئەگرێت و ئەیهێنێتەوە ژوورەوەو زوبێر لەبەری هەڵئەسێ))

# (( ئەڵقەی حەوت))

ڕێشار (( لوتبەرزیی)): ئەوەچییە دارەوان ئەفەنی ناتەوێ بمانبینی؟

دارەوان: نا کاکە گیان حەددی ئەوەمان نییە ببورە، بەس ئەم ئەوراقە (( ئەوەی دەستی پێ نیشان ئەدا)) کەمێک ئاڵۆزەو زوبێر تێی ناگا، ئەچم ڕوونی ئەکەمەوە..

ڕێشار: دەی وریابە ئەمە شەربەت نییە بە ئاو ڕوون ببێتەوە، ئەقڵی ئەوێ ئەقڵ، کە وابزانم تۆ کەمێک ئەو کێشەیەت هەیە.

دارەوان (( دان بەخۆدا گرتن)): وەڵا ئیتر بەپێی ئەو ئەقڵە کەمەم، خەریکی ئەبم.

ڕێشار (( بە چوار پەنجەی وەک ئیهانەو ئیهمال کردن ئاماژەی دەرەوەی بۆ ئەکا)): تۆ بڕۆ، لەم پیاوەشی مەشێوێنە قبوڵی ناکەم. (( دارەوان ئەچێتە دەرەوەو زوبێر ئەیەوێ لەسەر مێزو کورسیەکە هەستێ، ڕێشار بە دەست ئاماژەی بۆ ئەکا دانیشێتەوەو خۆی لە کورسییەکەی بەردەمی مێزەکە دائەنیشێ)) تۆ لە جێی خۆت دانیشە.. ئەوە چۆن لەگەڵ ئەم کەرپیاوەیا ئیدارە ئەکەی؟

زوبێر: بڵێم چی؟ ڕاهاتنەو هاوڕێی مناڵیمە.

ڕێشار: کەیفی خۆتانە دەی، ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە.. من بۆ بەشەکەی خۆم هاتووم.

زوبێر: لە خزمەتتام هەر ئێستا.

(( زوبێر دەرگای قاسەکە ئەکاتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣١ – ڕ/ د – ناو بازاڕ:

(( حەمە خدر لە شوێنێک دانیشتووەو عەرەبانی حەماڵییەکەی لەبەردەمدایە.. داڵغەی ڕۆشتووە ))

**حەمە خدر مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

(( پاشا، پاشا.. ئەبێ کێ بێ؟.. ئای خوایە! بۆ وا لێم عاسیی بووە.. ئەوەی لە چوواردەوریەتی هەمووی ئەناسم، ڕێشار حساب بۆ کەسیان ناکاو هەموویانی سووک کردووە، کەچی هەر بە مۆبایلەکە، کە قسەی ئەکرد، هەموو گیانی هەڵئەلەرزی.. کەواتە پاشا لەم دەوروبەرە نییە.. ئەبێ لە دەرەوەی هەموو ئەوانە بێ کە هامشۆی ئەکەن.. وایە، دڵنیام ئەگەر ئەو پاشایە دەرکەوێ، ڕێشار خۆی تەڕ ئەکا لە ترسا.. نا نا لەمناوە نییە ))

**مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە تەواو:**

(( نارەوەن بە ئۆتۆمۆبیلەکەی دێت خدر ئەبینێ.. دوو سێ جار بانگی ئەکات و خدر بەرەو پیری ڕائەکات ))

نارەوەن: ئەوە گوێت لێ نییە، شوکور گوێیەکەشت دانا؟

خدر: نەبەخوا داڵغەم ڕۆشتبوو نارەوەن خان بچووکیت ئەکەم.

نارەوەن: هەر خەیاڵت باش چوو بێ باشە!

خدر: وەڵا نارەوەن خان باش بوو خراپ نەبوو، لە کۆتایی داڵغەکەما کرێ خانووەکە دەبر بوو، هیچی وای نوقسان نییە.

نارەوەن: دەی لەخوا بەزیاد بێ، ئەی بۆ نایەی من کرێکەت بۆ بدەم و تۆش خزمەتێکم بکەی لە دەرەوەی ئیشی خۆت؟

خدر: وەی بەسەر هەردوو چاوم، بێ ئەوەی کرێشم بۆ بدەی، من هەر خزمەتت ئەکەم نارەوان خان، تۆ گەورەی ئێمەو هەموو لایەکی.

نارەوەن: بەڵێنیشم بدەرێ تەنها نێوانی خۆمان ئەبێت و کەس نەیزانێ. ئیتر با هەرچی شتێک لە نێوانمانا ئەگوزەرێ، تەنها بۆ خۆم و خۆت بێ.. زۆر تایبەت و نهێنیی.

خدر: تۆ ئەمرەکەی نارەوەن خان، بەڵێن بێ.. تازە من و تۆ حسابێکیترمان هەیە.. سەریشت لە پێناودا دائەنێم.. فەرمانکەو جێبەجێیکەم.

نارەوەن: ڕاستە.. ئیتر من و تۆ حسابێکیتر ئەکەین.... ئا.. سۆراخێکی ئەو دوو کچە، بێستان و تافانم بۆ بکە، بزانە ئیش و کارەکەیان چییە لەو کۆمپانیایە؟ بۆچی بە ئارەزووی خۆیان ئەچن و ئەگەڕێنەوە؟

خدر: ڕاستیەکەی منیش تێ ناگەم نارەوەن خان.. ناهێڵن هیچ کەسێکیش بچێتە ژوورەکەیان، ئەو ڕۆژە سەللەیەکی سەرمێزم بۆ بردنە ژوورەکەیان، منیش ویستم دەمەتەقێیەکیان لەگەڵ بکەم، هەر لەگەڵ سەللەکەم دانا، کرمانجەکەیان هات بە گژماو کردمیە دەرەوە.

نارەوەن: تۆ بەردەوام تاقیبیان بکەو هەرچییەکت دەستکەوت هەواڵم بدەرێ، دواییش وەرە بۆماڵەوە، کرێ خانووی ئەم مانگەت بدەمێ.. ژمارەی مۆبایلەکەشم بنوسە......

خدر: نا توخوا نارەوەن خان گیان، تکایە

نارەوەن: بیدەنگبەو هیچ مەڵێ.

((لە میوتیدا ژمارەی مۆبایلەکەی ئەداتێ و خدر دائەبەزێ و نارەوەن ئەڕوا.))

Cut

دیمەنی – ١٣٢ – ر/ د – بەردەم زانکۆی تیرۆژ:

(( تایەر ئەوسەری ڕێگەی لە تیرۆژ گرتووەو لە پۆلیسەکان دوور کەوتووەتەو پۆلیس دیار نەماون.. ئامۆ ئەگەڕێتەوە بە تەکسییەکەو تیرۆژ دێت و لایەکیتری جادە ئەگرێ، تایەر ئەچێتە بەردەمی))

تیرۆژ: بۆ وا ئەزانی نازانم تۆ بوویت؟

تایەر: بەخوا لە تاوی تۆ.. مەعز بۆ ڕەزای خوا ڕازی بە، وەڵاهی هەرچی بڵێی بۆت ئەکەم، خانوو، ماڵ، ئەوەندەت ئاڵتون بۆ ئەکەم، بچم و بۆنیتت دیار نەمێنێ، هەمووی بشارێتەوە.

تیرۆژ (( پێکەنین)): مەعلوم بچم و بۆنیتم ئەشاریتەوە؟!! هههها

تایەر: ئا ئاوهایی بەساقەوبم بم، تۆزێ پێبکەنە.. ئەرەوەڵاهی وا ئەکەم وەک چنگە پشیلە ئاڵتونت پیا هەڵگەڕێ.

تیرۆژ(( سەرداخستن و لەبەرخۆوە پێکەنین)): ئەزانی چی براکەم (( تایەر دەم و چاو ئەدا بەیەکا)) باوەڕ بکە من شوو ناکەم، خوێندنی زۆر زۆرم لەبەرە، خۆت بە منەوە دەستخەڕۆ مەکە تکایە، باوەڕ بکە هەر قەت قەت شوو ناکەم.

تایەر: دەساوەڵاهی چاک بیخەمە مستتەوە، یا بۆ منیت یا بۆ گڵ، ئەوە چاک بزانە من قەت قەت دەستت لێ هەڵناگرم تێگەیشتی؟ شو بکەی بە هەر کەسێکیش، بەخوا ناهێڵم بە ژیانت بحەسێیتەوە، نە خۆت و نە کابرای مێردت.

(( سەیارەی هاوڕێیەکی تیرۆژ دێت و ئەوەستێت، داوای لێ ئەکا سەرکەوێت، تیرۆژیش زۆر بە خێرایی سەرئەکەوێت، تایەر لە دواوە سەیریان ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٣٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو ڕێژوان دانیشتوون.. زوبێر نامەیەکی پێچراو لە دەستیدایە))

زوبێر: ئەم نامەیەم بۆ بگەیەنە ڕۆستەم.

ڕێژوان: نامەی چییە باوکە؟

زوبێر: هیچی وا نییە ئیشی تازەیە.

ڕێژوان: باوکە ئەی کاک دارەوان چی لێهات؟

زوبێر: نازانم، چووە دەرەوەی کۆمپانیا. تۆ بە پەلە ئەمە بگەیەنە. باش؟

ڕێژوان: سەرچاو باوە گیان، پێی ئەڵێم هەر ئێستا بێت بۆ ژوورەکەم.

زوبێر: با من نەبینێت و نامەکە نەکەیتەوە، خۆم پێموتووە نامەی کراوە وەرنەگرێ.

ڕێژوان: سەرچاو باوە گیان.

(( ڕێژوان ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣٤ – ڕ/د – بەر دوکانی ئاوا:

(( ئاوا لە دەرەوە وەستاوەو ئامۆ لە ژوورەوە، کەسێک شتێک ئەکڕێ و ئەڕوا ))

ئاوا: تا قەرەباڵغییەکە نەهاتووە، ئەچم بەلای سەیارەکەوە.

ئامۆ: ئەرەوەڵا بچۆ.. دایکم ئەڵێ بە کۆمرێسەرەکەش هەوام تێکردەوە، ئەوەندەی تێ ناچێ بیگەیەنیتە پەنچەرچییەک.

ئاوا: بەس ئەگەر ئەمزانی چ خوێڕییەک ئەو پارچە ئاسنانەی بۆ داناوم؟! بیللاهی وام لێ ئەکرد لەسەر قنگ خۆی بۆ نەگیرێ.

ئامۆ: هەرکەسێک بێ بەدوایا مەچۆ.. ئەوە بۆ سەرقاڵکردنی ئێمە ئەوە کراوە، بە ئاسانیی مەکەوە داوی کەسەوە ئاوا گیان.

ئاوا: جا خۆ ئەوەندە پیاو نییە خۆی دەرخاو.........!!!

ئامۆ: چارەسەرێ بدۆزەرەوە باشترە، وەختی پرتەو بۆڵە نییە.

ئاوا: چارەسەر هەر ئەوەیە جووتێ تایەو فەرمانی پەنچەرچی لەگەڵ خۆما ببەم شتێکی لێ بکەین تا ئەیگەیەنینە دوکانەکەی.

ئامۆ: جا فەرمان دێت؟

ئاوا: ئا، ئا زۆر کوڕی چاکە، هاوڕێمە، بۆ من دێت.

ئامۆ: دە تۆ بڕۆ، من ئاگام لەدەریشەوە ئەبێ.. دەرکەوت هەر کەسێکە نەیکەی بە هەرا، تا ئاگادارم نەکەیتەوە.

ئاوا: باشە باش، خوا ئەکا بۆم دەرئەکەوێێێێێێێ!!

(( ئاوا ئەڕواو ئامۆ سەر لە عینادیی ئاوا با ئەدا ))

Cut

دیمەنی – ١٣٥ - ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار- ژووری کرمانج:

(( کرمانج لە ژوورەوە دانیشتووەو بیر ئەکاتەوەو چایەکی لە بەردەستتایە.. پاش کەمێک.. محە ناشوکر دێتە ژوورەوە))

محە: ئەوە ڕێشار لە کوێیە کرمانج؟

کرمانج: تۆ سەیریکە چۆن هەموومان بە ناوی خۆمانەوە بانگ ئەکا، نە کاکێ، نە ئاغایەک، نە بەگێ، هەروا ڕووت و قووت.

محە: ڕۆڵە منالّەکانم بمانایە ئێستا لە ئێوە زۆر گەورەتر ئەبوون، من کاک و بەگ بۆ ئێوە بەکارناهێنم.. پێم بڵێ لە کوێیە؟ ویستم وەک هاتووم شتێ پارە لەویش وەرگرم.

کرمانج: خێر بوو هاتی؟

محە: سەرەو مالە ئیشیان پێمە.

کرمانج: ئا، هەندێ جلوبەرگە بۆیان داناوی، لای چایچییەکە.

محە: دەی دیارە ئەوەیە.

(( لە کاتی قسەکانی کرمانجدا بێستان و تافانیش دێنە ژوورەوە))

محە: بەهـ بەهـ ئەم سورە گوڵانەشتان لایە؟

(( هەردوکیان سوپاسی ئەکەن و بە مامە گیان سڵاوی لێ ئەکەن))

بێستان: ئەمانەوێ بڕۆین کاک کرمانج.

کرمانج: ئێوە ئیزنی خۆتان بەخۆتانە بەقوربان.. فەرموون.

تافان (( بە کەمێک فیزەوە)): هەر ویستمان ئاگادار بیت، نەک کاک ڕێشار هەواڵمان بپرسێ.

کرمانج: خواتان لەگەڵ. (( هەرسێکیان ئەچنە دەرەوە.. کرمانج.. بیرکردنەوە)) ــ Cut

دیمەنی – ١٣٦ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن دەرگا ئەکاتەوە، حەمە خدرەو فەرمووی لێ ئەکا دێتە حەوشەکەوە ))

خدر: بە ڕاستی جلوبەرگم لایەقی دانیشتن نیین لەگەڵتا، ئەگینا لە دەرەوە لە شوێنێک دائەنیشتین، چونکە زۆر هاتنیش بۆ ئێرە باش نییە، خۆت خەڵک ئەناسی.

نارەوەن: ئەو جلانەت ناهێڵم تاسەر بێ خدر گیان، خەڵکیش با بۆ خۆی هەر چەنەبا، چ کارمان بە قسەی خەڵکە.. وا بۆ ئیشێک بۆت ئەگەڕێم شایانی خۆت بێ، دڵنیابە بە مانگانەی زۆر زۆر باش ئیشت بۆ ئەدۆزمەوە، یان خۆم دوکانێکت بۆ دائەنێم.

خدر: نا جارێ لێگەڕێ نارەوەن خان، ئەرێ توخوا ئەو نارەوەن خانەش زۆر قورسە لەسەر زمانم، قبوڵە هەر بڵێم نارە خان؟

نارەوەن: بەڕاستیی تا ئێستە کەس وای پێ نەوتووم، بەڵام بۆ تۆ ئەوەش قبوڵە، هەرچیت پێخۆشە ئەوە بڵێ. گرنگ ئەوەیە ئیشی باشم بۆ بکەیت و هەواڵی خێرام بدەیتێ.

خدر: نارەخان، جارێ لەم ئیشە زۆرم دەست ئەکەوێ، تەواوی بازاڕو کۆمپانیاکانی ئەو دەوروبەرە پشتیان بە من بەستووە، بەوەش پارەی زۆرم دەست ئەکەوێ.. بەڵێ زۆرم پێخۆشە شتێکی ئەوتۆ پەیاکەم، دوکانێک بە یەکەوە دابنێین.. تۆ ئێستا گوێ بگرە هەواڵم بۆ هێناوی.

نارەوەن: دەی قوربانت بزانم.

خدر: کرمانجم بینی بە قەدوباڵای بێستانا ئەیبڕوانی.. هەر کە بێستان بینی ئەو لێی ورد ئەبێتەوە، خەندەیەکی بۆ کردو هیچی نەوت، وەک ئەوەی پێی خۆش بێ.

نارەوەن: هەواڵێکی زۆر باشە، ئەی ئەوانەیان بۆچی بردۆتە ئەوێ بۆ ئەوە نەبێ؟.. بەڵام نابێ یەک چرکەش چییە غافڵیانکەی.

خدر: خەمت نەبێ دەستنێژی خۆتم نارە خان گیان.

نارەوەن: دە بوەستە با کرێ خانووەکەشت بۆ بێنم.

خدر: باوەڕ بکە بۆ ئەوە نەهاتووم نارە خان، تکایە شەرمندەم مەکە.

نارەوەن: لەم مانگەوە، ئیتر کرێی خانووەکەت من ئەیدەم و هیچ پەیوەندیی بە تۆوە نەما.. تا ڕزگارت ئەکەم لەم ئیشە سەقەتە من دەست و دڵ و چاوم هەر لەسەر تۆ ئەبێ.

خدر: خوا کەریمە! با پارەیەکی باش پێکەوە بنێم، ئەوکاتە ئەبین بە شەریک.. ئای چەند سوپاسی خوا ئەکەم ئەو شەرەفەم پێ ڕەوا ببینی.

نارەوەن: دڵنیابە دەستت لێ هەڵناگرم، بەڵێن بێ.. ئەو خوا پێداوانە چییان لە تۆ زیاترە؟.. با دوا نەکەوی بچم پارەکە بێنم.

خدر: تکایە!

نارەوەن: دە دەمت داخەەەە.

(( خدر لە حەوشەکەدا چاوەڕوانی ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٣٧ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن بە هۆڵەکەدا دێت و ئەچێ، بروسکیش بە دیاریەوە لە گۆشەیەکدا وەستاوە))

چیمەن (( گرژ)): ئەی ئیشەکەی خۆت؟

بروسک: نازانم، وتی بە پەلە مارەبڕین و گواستنەوە تەواو ئەکەین و ئیتر لای من ئیش ئەکەی.

چیمەن: ئەی خۆ کاردۆو ڕێژوانی لەگەڵە.

بروسک: ئێ دیارە بەس نییە، ئەیەوێ منیشی لەگەڵ بم.

چیمەن: وا هەست ئەکەم باوکم بە نیازی دەرکردنی کاک دارەوان بێ.

بروسک: بۆ؟ هیچ هەیە؟ هیچت بیستووە؟

چیمەن: نا.. ڕاستەوخۆ هیچی نەوتووە، بەڵام ئەمشەو وتی، جاری واهەیە گومان ئەوەندە زاڵمە لە نینۆکەکانی خۆت ئەسڵەمیتەوە، ئەڵێی نەک لە شەودا شوێنێکی پێ بخورێنم و بریندارم بکا، یان چاوی خۆمی پێ بکرێنم، هەڵئەسی بە پەلە نینۆکت ئەکەی.

بروسک: جا ئەوە پەیوەندیی بە کاک دارەوانەوە چییە؟

چیمەن: ئەوە مانای ئەوەیە گومان لە هەموو کەسێک ئەکا، جاران ئەیوت دارەوان بە هیچ شێوەیەک ناخرێتە خانەی گومانەوە.. ئێستا شتێکیتر ئەڵێ.. ئەوە بزانە، قەت ڕاستەخۆ شتێک لە باوکم نابیستی، ئەبێ لە قسەکانیا مانا هەڵێنجی.

بروسک: کەواتە تا زووە، نیشان و مارەکردن هەر ئەمشەو تەواوکەین.. گواستنەوەش سبەی و دوو سبەی.

(( لە میوتیدا بەردەوام ئەبن کەمێک))

Cut

دیمەنی – ١٣٨ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( عەمید سەرکۆو نەقیب ڕاهۆز دانیشتوون، تەماشای دۆسیەیەک ئەکەن، لە میوتیدا هەندێ فۆتۆ (( دارەوان و ڕێشارو سەرەو مالەو زوبێرو بیستان و تافان و هەندرێن و محەو هاوڕێی چایچی و ئەردەلان و خدرو ئاواو ئامۆ )) ئەگەر دەربکەوێت و ڕاهۆز ناوەکانیان بە سەرکۆ ئەڵێت... پاش تەواو بوون و داخستنی دۆسیەکە))

سەرکۆ: یەعنی ئەوەی ونەو نازانرێ کێیە، سەری گەورەیانە، پاشا!

ڕاهۆز: بەڵێ گەورەم. بەپێی ڕاپۆرتەکان لەو دەوروبەرە نییە.

سەرکۆ: پێموابێ توشی ڕووبەڕو بوونەوە ئەبین لەگەڵ پاشاکەیاندا؟!

ڕاهۆز: چۆن گەورەم؟

سەرکۆ: کە خۆی نیشان نەدا لەو دەوروبەرە، هەڵبەت سەرقاڵی کاری زۆرە، واتە چەندین گروپی وەک ڕێشاری هەیە.. کەسێکیش لەو ئاستەدا بێ ئەو گروپانەی هەبێت، پێویستیی بە خۆپاراستنە، خۆپاراستنیش پێویستیی بە چەکدار هەیە، ئێستا تێگەیشتی؟

ڕاهۆز: زۆر ڕاستە گەورەم، من چاودێریی توندم خستۆتە سەر هاتوچۆی ڕێشار، بۆ کوێ ئەچێ و هەرچی ئەکاو نایکا.. تەنانەت لە ڕێگەی سیمکارتەکەشیەوە..هەر ئەیدۆزینەوە گەورەم.

سەرکۆ: ئاوا نادۆزرێتەوە، ئەویش ئەوەندە گێل نییە بهێڵێ ڕێشار هاتوچۆی بکا.. یان لە ناوخۆی ئەو خەڵکانەی ئەو دەوروبەرەدایە، بۆیە دەرناکەوێ.. یان کەسێک تەتەری نێوانیانە.. ئەگەر لە ناوخۆیاندا بێ ئالۆزترە لەوەی لە دەرەوەی خۆیان بێ.

ڕاهۆز: جیاوازییان چییە گەورەم؟

سەرکۆ: ئەگەر لە دەرەوە بێت، ئەوا ئەتوانین هەر ماوەیەک و چاودێری بخەینە سەر یەکێکیان و سەرەنجام دەرئەکەوێ ئەو تەتەرە کێیە.. بەلام لەو دەوروبەرەدا ڕۆژانە

هەموو یەکتر ئەبینن، چوزانین کامیانە، چونکە زۆر نهێنیی پارێزن.. بۆ نمونە، کێ نالێ یەکێ لەو کچانە نییە هێناویانن؟

ڕاهۆز: گەورەم ئاگاداری هێنانیان هەم، باوەڕ ناکەم.

سەرکۆ: بۆ ئیشی ئەو ئەوەیە، تۆ باوەڕ بکەی یان نا؟ کێ نالێ بۆ نمونە چایچییەکەی خوارەوە نییە، ئاگاداری وردو درشتی بازاڕەکەیەو ئەزانێ چۆن ڕۆڵیان بەسەردا دابەشکا.. ڕوویداوە ڕێشار بچێتە چایخانەکە؟ تا بزانی ڕاددەی ڕێزو پلەبەندیی نێوانیان چۆنە؟

ڕاهۆز: نە ڕێشار ئەچێتە چایخانەو نە چایچیەکەش ئەچێ بۆلای ئەو. ڕێشار چایچیی خۆی هەیە.

سەرکۆ: ورد چاودێریی ئەویش و هەموو ئەو کەسانە بکەن ڕێشار ئەیانبینێ، بە محەی ناشوکریشەوە.. ئێستا کەمێک بۆ ئەوە ئەچم ئەو سەرگەورەیە لەو دەوروبەرە بێت، چونکە ڕاپۆرتی شارەکان و شاروچکەکان ناوی هیچ جۆرە گروپێکی چەتەی ئاوا گەورە ناهێنن و بوونی نییە. کەواتە خاڵی یەکەم ئەوەیە، دواتریش شتیتر دەرئەکەون.. پشت بە هەموو کەسێک ببەستن کە شتێکی لێ هەڵکرێنن، گەر پشت پێ بەستراوی خۆشمان نەبێ.

ڕاهۆز: تێگەیشتم گەورەم زۆر ڕاستە.

پۆلیسێک ((بە جلی مەدەنییەوە لە دەرگا ئەداو تحیة ئەکا، فایلێکی بەدەستەوەیە)): گەورەم ڕاپۆرتی پزیشکیی کوژراوەکەیە. (( فایلەکەی بۆ ئەهێنێ))

ڕاهۆز: ئێستا ئەچم بەلای کارمەوە گەورەم.

سەرکۆ: بیرت نەچێ نەقیب ڕاهۆز، سەرەتا ئەوەی پێموتی.

ڕاهۆز: سەرچاو گەورەم (( تحیة ئەکات و ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٣٩ – ڕ/ د – قاوەخانەکەی تریفە:

Mute

(( لە میوتیدا بارێک ئاو لە دووطنییەک دائەگیرێت، دوو کەسەکەی پشتەوەی قاوەخانەکە دایئەگرن و سەرقاڵی بردنە ژوورەوەی ئەبن، تریفە کاری ئاسایی خۆی ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٤٠ – ش/د – ناو سەیارەی زوبێر:

(( زوبێر شۆفێرە، ڕۆستەم و سالم یەکیان لە تەنیشتی و ئەویتریان لە دواوە دانیشتووەو سەری هێناوەتە پێشەوە بۆ گوێگرتن ))

زوبێر: ئیتر ئەمە یەکەمجارو دواجارە یەکتر ئەبینینەوە.. هەرچییەکم ویست هەر لە ڕێگەی نامەی وەک ئەوەی ئەمڕۆوە بە دەستوخەتی خۆم بە کوڕەکەما بۆتان ئەنێرم، دووبارەی ئەکەمەوە نامەی کراوە وەرناگرن.. ئێوەش هەر شتێکتان پێویست بوو بە ڕێژوانی ئەڵێن.. بە هیچ جۆرێک نە من ئەناسن و نە ئەتانناسم.

ڕۆستەم: بەڵێ ماملۆستا گیان، هەرچیت فەرمووە لەبەرمە.

سالم (( لە دواوەیە)): بەڵام خۆت ئەزانی هەر ئیشێک پێویستی بە پارەی خۆی هەیەو ئێمەش کە ژیانی خۆمان ئەخەینە مەترسییەوە، هەڵبەتا پێویستیمان بەو پارەیەیە.

زوبێر: بە هیچ جۆرێک خەمی پارەتان نەبێت، گرنگ ئەوەیە ئەوی ئەیڵێم جێبەجێی بکەن.. خۆ ڕەنگە دوو ڕۆژیتر پێویستیم بە ئێوە بێ لە دەوری خۆم بن. بەڵام با جارێ ئاوا بێ، ئەم داوایەشم لەسەر قسەکەی خۆتان بوو کە وتتان هەموو شتێکت بۆ ئەکەین.

ڕۆستەم: خوا کەریمە، هەرچییەک جەنابت بفەرمووی لە خزمەتداین.. ئەی کاکە ڕێژوان هەر لە کوێ ببینین؟

زوبێر: ئەمشەو ناکرێ، ماڵ قەرەباڵغەو پێویستم پێیەتی.. سبەی نیوەی پارەکەتان بۆ ئەهێنێ.. بەڵام بە هیچ شێوەیەک نابێ ئاگاداری هیچ شتێک بێت و هیچیشی پێ ناڵێن.. ئیتر خۆ خۆشتان ئاقڵن تێئەگەن.

Cut

دیمەنی – ١٤١ – ش/ن - ماڵی هەندرێن:

(( تافان تەماشای تیڤی ئەکات و کڵپەو باڵا یاری ((٥، ٥)) ئەکەن.. لە ناو قاو و قیژی منالاندا کێ خانەی زیاتری پڕ کردۆتەوەو کێ کەمترو دەنگی تیڤی.. دەنگی دەرگا کردنەوە دێت و هەندرێن دێتە ژوورەوە، بەخێرهاتنەوەو کزکردنی تەلەفزیۆن و منالْ لە باوەش کردن))

تافان: دەی منالْ بۆ ئەودیو.

باڵا: نەخێر نارۆین، بۆ هەر حەز ئەکەی لەگەڵ باوکمان نەبین؟

کڵپە: نانمان نەخواردووە، ئێمەش برسیمانە، لەگەڵ باوکم نان ئەخۆین.

هەندرێن: جارێ لێیانگەڕێ، با نان و چاکە بخۆین.

(( بە پەلە سفرە ڕائەخات و باینجانی سوورەوەکراو و تەماتەو سەوزە دائەنێت))

باڵا: وەڵا من باینجان ناخۆم، پەتاتەم بۆ سوورکەرەوە.

تافان: ئۆهـ بیرم چوو بیهێنم، جا ئێوە ئەهێڵن کەس هیچی بیر بمێنێ؟

(( پەتاتەکەشی بۆ ئەهێنێ و دەست ئەکەن بە نانخواردن))

تافان: چیتکرد؟ چووی بۆ لای ڕێشار؟

هەندرێن: چووم.. سبەی دێمە کۆمپانیا.

تافان (( دڵخۆشیی زۆر)): ئەی لە خوا بەزیاد بێ، ئۆهـ خوایە نەیبڕی.. ماڵی ئاوا بێ هەزارجار.

کڵپە: وەڵا شتمان ئەوێ، ئەبێ شتی دنیامان بۆ بکڕیت.

باڵا(( خۆی لالوت ئەکا)): وازیان لێ بێنە، ویستیان بمانکەنە دەرەوە، بە دزییەوە باسی شتە خۆشەکان ئەکەن.

هەندرێن: کچێ بەقوربانی کچی خۆم ئەبم، بەساقەی کوڕی خۆم ئەبم، چۆن بێ ئێوە دڵمان خۆش ئەبێ.. هەرچی خۆشیی دنیامان هەیە ئێوەن.. هەرچیتان حەز لێ بێ، دەمودەست بۆتان ئەکەین.

باڵا: دە ئەگەر ڕاست ئەکەی سەگێکی توکنم بۆ بکڕە، هەموو هاوڕێکانم هەیانە، هەر من نیمە.

(( هەندرێن و تافان بە خەندەوە سەیری یەک ئەکەن، تافان لچ هەڵئەقورتێنێ وەک ئاماژە بۆ ئەوەی بڵێ چەند عەیارە))

کڵپە: منیش مەیمونم ئەوێ، ئەو برادەرەم هەیەتی، زۆر خۆشە.

هەندرێن: وەی بەسەرچاو، بەس دووساڵیتر، با جارێ تۆزێ شوێنان بگەڕێین و شتە پێویستەکان بکڕین، ئەوسا هههها

(( لە میوتیدا سوعبەت و پێکەنین و بە یەکا کێشان و توڕەبوونی تافان))

Cut

دیمەنی – ١٤٢ – ڕ/ د – ناو بازاڕ:

((ئەردەڵان عەرەبانەکەی لە تەنیشتەوە داناوە.. بێستان بە بەردەمیا ئەڕوا..))

ئەردەڵان (( لەبەر خۆیەوە)): خوا هەر بەمانەی ئەدا، هەر لە پڕا ئەبن بە شت و دەوڵەمەند ئەبن و سبەی و دوو سبەیش پۆزلێدەرێکیتر بۆ من زیاد ئەکا، ئینجا وەرە ئەردەڵانی داماو ئەم هەموو پۆزو فەرمانە قبوڵ بکەو نقەشت لێوە نەیەت.. دەی خوا بۆ ناشرین دروستت کردم؟ دەی بۆ کوڕ بم و ناشرین بم؟ دەی ئاخر وەک کوڕێکی ناشرین بووم، بۆ ڕووت و ڕەجاڵیش بم؟.. ئای خوا بە گلەیی نەبێ هەزار شوکور بۆ بەشت، سەرباری ئەو هەموو عەیب و عارەم، حەمە خدریشت بۆ ناردووم، بە زمانە لووسەکەی هەموو ئیشی ئەمناوەی پێچاوەتەوەو ناهێڵێ هیچم دەستکەوێ (( حەمە خدر لەو کاتەدا بە بەردەمیا ئەڕوات و بارێک لەسەر عەرەبانەکەیەتی)) ئەهـ ئەها چەند بازاڕی گەرمە؟! ئەوەش ملۆزمەکەم!؟

(( تا حەمە خدر لە چاو ون ئەبێ دیقەتی ئەدات و سەر با ئەدات))

Cut

دیمەنی – ١٤٣ – ڕ/ ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار لە میوتیدا تێل ئەکا.. کرمانج دێتە ژوورەوە، ڕێشار تەلەفونەکەی تەواو ئەکات.. کرمانج دائەنیشێت))

ڕێشار: ڕەنگە لەم ڕۆژانەدا بارێکمان بۆ بێتە سەر سنوور، من و کچەکان و هەندرێن ئەچین.. با کچەکانیش نەڵێن بێکار دانیشتووین.

کرمانج: هەندرێن بۆ جەرد کردن، ئەی کچەکان هەر بۆ جەوگۆڕین؟ ببورە ئەڵێم ڕەنگە ئاوا پێیان خۆش نەبێ.

ڕێشار: وایە.. نا بەوان بڵێ هەندرێن و ژنەکەی بۆ جەرد کردن، لەبەرئەوەی ئەو بارە ئەخرێتە مەخزەنەوە، ئەویتریشیان کۆمپیالەو مەسەلە حسابییەکان ڕێک بخا.. نازانم گرنگ ئەوەیە وا بزانن بۆ ئیش دێن بۆ ئەوێ، من هەر هەندرێنم بەسە، ڕاستیەکەی خۆشم هەر لەبەر ئەوان ئەچم، تا وا بزانن بەڕاست ئیشە.

کرمانج: زۆر باشە، ئەگەر پێویست بە منیش بکا، دێم.

ڕێشار: نا پێویست ناکا.. سەرەو مالەش لەگەڵ خۆما ئەبەم بەسە.

کرمانج: حەماڵەکانیش گلەییان هەیە ئەڵێن وەک جاران ئیشەکان نادەن بە ئێمەو حەماڵی دەرەوە ئەهێنن.

ڕێشار: چاویان دەرئەهات.. ئەزانم باسی بارکردنی ئاوەکە ئەکەن، ئەوە هەڵشۆی خاوەن قاوەخانەکە داوای لێکردووم سەیارەی خۆی و حەماڵی خۆی بنێرێ.

کرمانج: بەڵێ خۆ پێم وتن بەخوا منیش ئاگاداری هیچ نیم، هەر کاک ڕێشار خۆی سەرپەرشتی ئەکا،

ڕێشار (( هەڵوێستە کردنێک)): ئاخر ئەبێ تەنها هەر خۆشم بزانم چەند بار ئەکاو ناکا، زاوای ئەو دارەوانەیە ئەڵێم با بیانوویەکمان لێ نەدۆزێتەوە، هەر خۆم ئەچم، ئیتر لەگەڵیا سەعلەم و شەکرو ئاردیشیان بۆ ئەنێرم.. قەیچێکا با منیش شتێک بکەم.

کرمانج: قوربان گیان، ئەڵێم بەو هەندرێنە بڵێین لەمەولا حەماڵەکان وەک یەک بەکار بهێنێ با گلەیی نەکەن، باش بە دەممانەوە هەڵئەسوڕێن

ڕێشار: جا بۆ نا؟ ئەمڕۆ هەر چوارو پێنجیان بانگکەو بە ناوی منەوە شتێکیان بدەرێ.

کرمانج: ئەوە زۆر باشە گەورەم.. فەقیر کە پارەی خۆڕاییت دایە، زۆر لەبەرچاوی ئەبێ و ئیتر زیاتر دوات ئەکەوێ.

ڕێشار: تۆ کچەکان تێگەیەنەو پێیان بڵێ لەم ڕۆژانەدا ئەچین.. ئا با ئەو خدرە حەماڵەکەش بێت، بەخوا هەر ئەویان تیایە کەمێک بجوڵێ.

(( لە میوتیدا قسەی خۆیان تەواو ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ١٤٤ – ڕ/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن لەبەر خۆیەوە قسە ئەکات و بە پەنجەش لەسەر دیوارەکە خەت ئەکێشێ و بە پێێ دیالۆگەکەی هەر بە خەیاڵی خۆی ئەیسڕێتەوەو دووبارە خەت ئەکێشێتەوە))

نارەوەن (( خاڵێک بە پەنجە تۆخ ئەکاتەوە)): ئەمە ڕێشاری سەگ.. (( خەت ئەکێشێ بۆ شوێنێکیتر، لەوێش دوو خاڵ دائەنێ)) ئەمەش بێستان و تافانی لەبرسامردوو... باشە، ئینجا ئەمەش (( هێڵ بۆ شوێنێکیترو خاڵ)) ئەمەش کرمانجە کەللەپووت.. دەی هەندرێنی بۆ بردۆتە لای خۆی؟ ئەی ئەو خۆ شوێنی نییە.. من ئەبێ لەمە تێبگەم، دەی من کەی وابووم (( هێڵە وەهمییەکان ئەکوژێنێتەوەو دووبارە دەست پێ ئەکاتەوە)) ئەمە کرمانج کە حەزی لە بێستانە، نابێ حەزی لە تافان بێت، ئەو مێردی هەیە.. دەی (( چوارچێوەیەکی بچووک ئەکێشێ)) ئەمەش ژووری ئەو دووە کە لە هەموو کەسێک قەدەغە کراوە.. نەبەخوا ئاواش هەر نابێ (( ئەیسڕێتەوە)) ئەی ئەوسا کرمانجیش بۆی نابێت بچێتە ژوورەکەیان.. ئای خوایە کەی ئەوەندە دەبەنگ بووم؟ بۆ نەزانم بۆچی ئەو دووەی بردۆتە لای خۆی؟ جا خۆ مێشکم ئەتەقێ نەیدۆزمەوە!!! ئەو خدرە دەماغسزەش هیچ نازانێ.. نەبابە ناهێڵن هیچ بزانێ، بەخوا بەخوا ئیشێکی زۆر قووڵیان بەم دووانە هەیە.

تیرۆژ (( دێتە ژوورەوە بە پێکەنینەوە)): چی بوو هەر بۆت نەدۆزرایەوە؟

نارەوەن: نەبەخوا خەریکە مێشم بتەقێ.

تیرۆژ: ئێ باشە دایە گیان بۆ ئەبێ شتی هەموو خەڵک بزانی؟

نارەوەن: دە تۆ دەمت داخە.

تیرۆژ(( پێکەنین)): خۆزگە دایە لە دواوە خۆت ئەبینی چی ئەکەی، بیللاهی ژان ئەکەی لە پێکەنینا.. هههە ئەوە بۆ بە ڤیدیۆ رەسمت بۆ نەگرم و بینبینی؟ هەهە

نارەوەن(( ڕاوی ئەنێ)): ئا ئا ئا... خۆ هەموو شتێکی بیر بردمەوە! قەشمەرییم پێئەکا!

(( تیرۆژ ڕاو ئەنێت)) ________ Cut ________

دیمەنی – ١٤٥ – ڕ/ ئێوارە/ ن – چایخانەکە:

(( خدر و هاوڕێ و ئەردەڵان دانیشتوون))

خدر: نە بەخوا، نە ئاوی ئەمجارەو نە جارەکانیتریش من بارم نەکردوون.. تۆ هەر لە خۆتەوە شەرم پێ ئەفرۆشی!

ئەردەڵان: ئەی خۆ باوکیشم باری نەکردن؟ تۆ هەموو ئیشەکانی ئێمەت بردووە بۆ خۆت، هیچت بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە (( بۆ هاوڕێ)) کورە لەماڵیشەوە ئیشیان هەبێ بانگی ئەکەن. (( بۆ خدر)) بۆ وا ئەزانی ئەوڕۆژە نەمبینیت لە سەیارەی ژنەکەی کاک دارەوانا؟ نەیبردی بۆ ئیش؟! ئەی هاوار ئەرێ تۆ بە چی تێر ئەخۆی؟

خدر: ئەرێ کاکە مادام مەسەلەکە زمانلووسییە وەک تۆ ئەڵێیت و منیش ئەڵێم دەم و لەفز شیرینیی و گورج و گۆڵییە.. تۆش تۆزێ زمانلووسیی بکەو با ئیشت بدەنێ، ئاحححح خۆ نایبڕێتەوە.

هاوڕێ (( لە کاتی قسەی هاوڕێدا ڕۆستەم دێتە ژوورەوەو لە دوورەوە ئاماژەی خدر ئەکا بچێ بۆ لای)): ئەرێ کاکە سڵاواتبەن، ئەم دەنگە دەنگەتان لە چییە؟ بەخوا خوا چۆنی دابەش کردبێ هەر ئەوەیە، کەس ڕسقی کەس ناخوا.

خدر (( هەڵئەسێ بۆ لای ڕۆستەم، بۆ هاوڕێ)): دە بە ئەردەڵان بڵێ. (( ئەڕوات))

ئەردەڵان: ئەوە دیارە ئەویش ئیشی هەیە، هەر بەو ئەڵێ، وەڵا بابە ئەوەندە لوگێتیی ئەکا، کەس ئیشی بە ئێمە نەماوە.

ـــــــ تابع ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٤٦ – متبوع – ڕ/ ئێوارە/ د – دەرەوەی چایخانەکە:

(( ڕۆستەم لە چایخانەکە دێتە دەرەوە، دێت بۆ لای سالم وەستاوە.. پاش کەمێکیش خدر دێت))

ڕۆستەم(( بۆ سالم)): پێموت.. وا دێت.

خدر (( دێتە لایان)): ئەرێ نەموت لە شوێنی گشتی ئێمە یەکتر ناناسین.. بۆ هاتی؟ وەرن وەرن بچینە ئەو پەنایەوە. ئەی ئەگەر ئێستا کاک زوبێر یان یەکێکیان پەیا بوون؟

ڕۆستەم: کورە گشتیی چیی؟ دوو کەسی لێیە.. یەک قسەیە پێت بڵێین و ئەڕۆین!

خدر: دەی باشە خێرا.

سالم: داوای کردووە ژنێکی بۆ بکوژین!

خدر (( شڵەژان)): ژن کێ؟!!!!! چۆن شتی وا ئەبێ؟

سالم: نازانین کێیە. لەم نامەیەدا نوسراوەو مۆڵێک پارەشی ناردووە

خدر: هەر کەسێک بێ، جارێ هیچ پەلە مەکەن..پێی بڵێن ئەبێ جارێ چاودێریی بکەین و کات و شوێنی لەباری بۆ دیاریی بکەین، بڵێن ئەبێ زۆر دڵنیا بین کە سەرکەوتوو ئەبین، ئەوسا دەستی لێ ئەوەشێنین.. نەکەن هەڵەی تیا بکەن ها!! ئەگینا هەمووتان تیا ئەچین و خۆیشی خراپی بەسەر دێت.

ڕۆستەم: ئەی وایە خۆ دەمودەست و سەربەخۆ ناچین بیکوژین.

خدر: بۆ پارەکەش ئەزانم زوبێر پارەیەکی مفتی هەیە. با بچین لە ماڵی ئێمە نامەکەی بخوێنینەوە، جارێ با بزانین ئەوە کە کێیە ئەبێ بکوژرێ؟

سالم: ئەرەوەڵا هەر پێشەکیەکەی زۆری بۆ ناردووین، بەشی هەموومان ئەکا.

خدر: ئێهـ ئێمە شەریکین، من ڕێگەتان بۆ دائەنێم و ئێوە جێ بەجێی بکەن.. یەکەم ڕۆژیش بڕیارمان وابووە، هەموو شتێک بە من بڵێن و خۆم ڕێ و جێتان بۆ دابنێم.

ڕۆستەم: ئاخر دوایی ئەیکوژین؟ یان هیچ؟

خدر: نا نا هەرچی ئەو ئەمر بکا ئەیکەین.. گرنگ پارەیە پارە.. بەس سەرەتا ئەبێ هەموو شتێک تەئمینکەین ئەوسا.

سالم: ئێ ئاوا باشە، توخوا با تێنەکەوین.

خدر: خەمتان نەبێ، هەمووی لەسەر من.. سەرەتا با بچینە ماڵەکەی خۆم! بزانین کێیە؟

سالم: ئەی بۆ لێرە نایکەیتەوە؟

خدر: نەک یەکێ بێ بەسەرا، پەلەمان چییە، ماڵەوە ئەمینترە.

ڕۆستەم: با بڕۆین.

خدر: خوا بکا کەسێکی ئاسانیش بێ.

(( پێکەوە ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٤٧ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان و کلێپە لە ماڵەوەن.. ))

کلێپە: دایکە باڵا چاک ئەبێتەوە؟

تافان: ئا ئا کلێپە گیان هیچ نییە، سەرمای بووە، هیچ نییە، هەر دەرزییەکی لێ ئەدەن و ئێستا باوکت ئەیهێنیتەوە.

کلێپە: وەیش توخوا گوناحە، ئەی بە بێ دەرزی چاک نابێ؟

تافان: ئەی کە پێتان ئەڵێم خۆتان گەرم بگرن با سەرماتان نەبێ، مەبەستم ئەوەیە ئاواتان بەسەر نەیەت.. ئەی چۆن، ئێوەش بە قسەم ناکەن.

کلێپە: وەڵا خۆشمان گەرم ئەگرین، کەچی هەر نەخۆشیش ئەکەوین.. بەس مامۆستا وتی پەتایە، سەرمانییە.

تافان: ئاخر بە بۆنەی یەکێکەوە کە سەرمای ئەبێ و نەخۆش ئەکەوێ، ئیتر نەخۆشییەکە لە پۆلەکەتانا بڵاوئەبێتەوەو هەموو ئەیگرن.. ئەوە هاتنەوە.

(( هەندرین و باڵا دێنە ژوورەوە، باڵا نەخۆش دیارە ))

تافان (( باوەشی ئەکاو ماچی ئەکا )): باش بووی بەقوربانت بم؟!

باڵا: نەوەڵا هەر خراپم، سەرم یەشێت.

تافان: با جێیەکەت بۆ ڕاخەم، خۆت گەرم داپۆشە، بەیانی هەستای عەلەمت نامێنێ، کلێپە دەی تۆش هەستە، با گەرم داتانپۆشم.

(( تافان و باڵاو کلێپە ئەچنە دەرەوە، هەندرێن کەناڵەکانی تەلەفزیۆن ئەگۆڕێ، تا تافان دێتەوە ))

تافان: مەرز کوێیە هەندرێن؟ بەقەدەر دنیا دڵم خۆشە کە تۆش لەگەڵمانا دێیت.

هەندرێن: چوزانم کاملایە، بە منیش هەر وتراوە بۆ سەر مەرز.

تافان: ئێستا زۆر دڵخۆشم کە ئیشێکی ڕاستەقینەمان هەیە لە کۆمپانیاکە.

هەندرێن: نازانم کە ئێمە ئەڕۆین ئێوەی بۆچییە؟ لەوە تێناگەم؟!

تافان: ئەی چۆن؟ شتەکان ئەخرێنە مەخزەنەوە، ئەبێ من بیانژمێرم. بێستانیش حساباتی پارەکەیان بۆ ئەکا.

هەندرێن (( پێکەنین)): کە داماویت؟! هەهە وا ئەزانی ئەم گروپە ئەوەندە ئاسان و دڵسافن؟.. بە دڵسافیی خۆتا تێنەکەوی باشە!

تافان: ئۆهۆووو تۆش ئەوەندە لە هەموو شتێکی ئەو کاک ڕێشارە بە گومانی؟! تەواو ناخۆشت کردووە. ئەزانی چی؟ ئەوە ڕۆژەکەیە پێت ئەڵێم و باش لە بیرت بێ.. بزانە بەهۆی ئەو کاک ڕێشارەوە چۆن ژیانمان ئەگۆڕێت و چەند دەوڵەمەند ئەبین؟!

هەندرێن (( کۆپلەی یەکەمی گۆرانییەکە ئەڵێ)): خەوە خەیاڵە ئەرزە بەهەشتە؟! هەڵپەڕکێی ژنە؟ یا هی فریشتە؟

تافان: دەی هەر گاڵتەت بە قسەکانم بێت! تۆ هەر وا نەبووی؟! (( ئەچێتە دەرەوە))

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ١٤٨ – ش/ن – ماڵی تایەر:

(( تایەر لاپتۆپێکی لەبەردەستایە.. سەرقاڵی نوسین و چاپ و کۆپی پەیستە))

تایەر: ئەرەوەڵا ئەوە ناوی فەیلەسوفێک، پلۆتۆ.. ئادەی ئەم پلۆتۆیە کێیە، با سبەی کە چوومە سەر ڕێگەی بڕیک بۆی باسکەم، با بە ڕۆشنبیرم بزانێ... ئەک ماڵت ئاوا بێ گوگڵ.. کورە ئێستا شیعرێکیشی لە فەیسبوک و مەیسبوکە بۆ کۆپی ئەکەم ئەڵێم شیعری خۆمە، ئەو چوزانێ؟.. بەس ئەگەر فەیسبوکەکەیم ئەزانی؟؟؟ ئادەی ئادەی گریک؟ بەخوا باشە خەڵکی گریکە، ئەی گریک کوێیە؟ کورە دە بۆچی بزانم کوێیە، ئیشی چیم پێیەتی؟ پێی ئەڵێم و تەواو.. ئەم پلۆتۆیە هههە بەخوا دەستم کەوت. ئەهاااااا ئەهاااا ئەی چی هەر کەمێک لە ژیانەکەی بەسە .... ئاهـــااا (( سەرقاڵ ئەبێت لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ١٤٩ – ش/ن – بەر ماڵی خدر:

(( خدرو ڕۆستەم و سالم بەرەو ماڵەوە ئەچن.. خدر لە دەرگا کردنەوەدا ئەبێت، زەنگی بۆ دێت، وەڵام ئەداتەوە))

خدر: بەڵێ؟....... (( شڵەژان)) چۆن شتی وا ڕووئەدا؟ ئەمە لەکوێ؟..........

# (( ئەڵقەی هەشت))

.......... بەچی؟ باری کێی بەسەرا کەوتووە؟ ...... تۆ پێم بڵێ ئێستا لە کوێیە؟...........ئەی تەندروستیی چۆنە؟ خەتەر نییە؟...... وا هاتم هاتم، لە فریاکەوتنن؟ (( تەلەفونەکە دائەخاتەوە)) باوکی خۆم ڕۆ!!!

ڕۆستەم: ئەوە چی ڕوویداوە حەمەخدر؟

خدر: کورە ئەحەی برازام بە کەڵەکەترێ بارێک گڵۆپی سورەیای بەسەریەکا هەڵچنیوە، هەم کەڵەکە ترێکەی بەسەرا ڕوخاوەو هەم زیانی زۆریشی بە کابرای خاوەنی گەیاندووە، با جارێ خێرا بچین بۆ فریاکەوتن.

سالم: ناڵێ بارەکە هی کێیە؟

خدر: نەمپرسی.

ڕۆستەم: دەبا بڕۆین.

(( دێنە سەر جادەو تەکسیەک ئەگرن، یان تەکسیەکی نزیک لە خۆیان))

Cut

دیمەنی – ١٥٠ – ش/ن – دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( ئامۆو ئاوا چەند مشتەریەک لە میوتیدا بەرێ ئەکەن، کەس نامێنێت))

ئامۆ (( دیقەتی دەرەوە ئەدا)): بازاڕیش وا خەریکە چۆڵ ئەبێ.

ئاوا(( هەڵپەیەتی)): ئامۆ گیان ئەگەر داشینەخەین، من هەر ئەبێ بڕۆم، بەخوا مەوعیدم هەیە لەگەڵ کاروان و ئەسوەدا لە بلیاردەکە.

ئامۆ: دەی دەست و بردکە با دایخەین، منیش هەر ئەچم بۆ قاوەخانەکەی لای ماڵەوە، کاتی قاوەخانەیە.

ئاوا: بەس با تاک و لۆ نەکەوین، پێش ئەوەی بگەڕێیتەوە، تێلم بۆ بکە، با بێمەوە بۆ لای تۆو پێکەوە بڕۆینەوە.

ئامۆ: ئەی هەروانییە؟ ئەگەر دایکم ئەزانێ هەریەکەو لە شوێنێکین؟! ئای چیمان پێ ئەکا؟

(( بە پێکەنینەوە دوکان کۆ ئەکەنەوەو هاوڕێ بە هەڵەداوان دێت))

هاوڕێ: کاک ئامۆ، کاک ئاوا.

ئامۆ: ها خێر چی بووە؟.

هاوڕێ: بارە سورەیاکەتان ئەوەی بۆ بیناکەی کاک شەریفتان ناردبوو هەمووی شکا.

ئاوا: چۆن؟؟؟؟؟ کێ شکاندی؟

هاوڕێ: حەماڵ حەماڵ خێرا وەرن.

Cut

دیمەنی – ١٥١ – ش/ن – ماڵی دارەوان:
(( نارەوەن شڵەژاوەو مۆبایل تێل ئەکا، تیرۆژ دیقەتی ئەدا))
نارەوەن: ١- چۆن؟ چۆن ئەمە ڕوویدا؟ ....... ٢- ئاخر کێ شکاندوونی؟ خۆ گاڵتە نییە؟ تۆ پێم بڵێ کوڕەکان سەلامەتن؟ .......... ٣- ئەیرۆ حەماڵەکە کێیە؟ ئەوە نەبێ ئیشەکان بۆ من ئەکا؟ ..... ٤- نا کە ئەو نەبێ چ کارمان بە حەماڵەوە هەیە، من ئیشی زۆری ناوماڵم ماوە، بۆیە خەمم بوو ئەو بێ.......... ٥- وەی بەزیای خێرم نەکرد، درەنگتر کەیە؟ جا بۆ بەیانی هەر لەوێوە ناچن بۆ سەر ئیشیش؟ ئێوە ماڵتان بۆچییە؟......... ٦- دە باشە دەی خۆت تورە مەکە تێگەیشتم.. ئاگاتان لە خۆتان بێ. (( مۆبایل دائەخاتەوە))
تیرۆژ: ئەوە چی بووە دایکە؟
نارەوەن: وەڵا بارە سورەیایەکی کاکت و ئاوا وردو خاش بووە بەدەست حەماڵێکەوەو زەرەری دنیای لێداون..
تیرۆژ: ئۆو بۆیان نایەت ئەو داماوانەش.
نارەوەن: با هەواڵێکی ئەو کابرایەی ئیشەکانمان بۆ ئەکا، هی ئەویش بپرسم، ئەڵێن برازایەتی، نەک خوانەخواست بمرێ، بەخوا هەرچی ئیشم هەیە پەکی ئەکەوێ تا لە تەعزێ و مەعزێ تەواو ئەبن.
تیرۆژ: نا ئیشەڵڵا هیچی خراپ نابێ.
(( نارەوەن تێل بۆ خدر))
نارەوەن: ١- خدر گیان چۆنی بەقوربان؟ برازاکەت چۆنە؟......... ٢- خوا ڕەحمی پێ ئەکا ئیشەڵڵا، خەفەتی لێ مەخۆ........ ٣- خەمی هیچ شتێکت نەبێ خدر گیان، هەموو شتێک چارەسەری هەیە.. ئێستا هەر بۆ هەواڵپرسینی خۆت تێلم کرد، دواتر قسە ئەکەینەوەو وەک وتم، هیچ خەفەتی لێ مەخۆ خۆم ئەوەت بۆ چارەسەر ئەکەم....... ٤- وتم کاتی ئەوەم نییەو دەمت داخە، بەیانی قسە ئەکەینەوە، با بزانین چۆن ئەبێ..... ٥- خواحافیز. ــــ Cut ــــــــ

دیمەنی – ١٥٢ – ش/د – نزیک بینایەک:
(( دارەوان مۆبایل تێل بۆ نارەوەن ئەکا، ئاواو ئامۆ بە دیاریەوەن))
دارەوان: ١- تازە چۆن و مۆنی پێ ناوێ، قەزاو بەڵای مناڵەکانی بردبێ....... ٢- کوڕ سەلامەتن نارەوەن گیان، کوڕ هەر لەوێ نەبوون، حەماڵێک دایگرتوون و هەمووی لەسەر یەک هەڵچنیون، ئیتر ڕوخاون و خۆیشی بریندار بووە، هەر پارچەو لەتی شوشە وێرانی کردووە ........٣- نا نا حەمەخدر نییە، وابزانم یەکێک لە برازاکانییەتی.. چییە خەمی ئەویش بخۆین؟ ........ (( بۆ کوڕەکانی گاڵتەی پێی دێت)) ٤- کچێ ژنەکە ئێمە لە خەمی چییاین و تۆش لە خەمی تەعمیری ماڵا... ویستم پێت بڵێین شتێکی وا ڕوویداوە، ڕەنگە درەنگتر بێینەوە ........ ٥- بەسی بێ بیبڕەوە، تۆش لەبۆڵە ناکەوی.. ئیتر ئاوایە......... ٦- دەی خواحافیز.
ـــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــ

دیمەنی – ١٥٣ – ش/ د – بەر دەرگای فریاکەوتن:
(( خدر وەڵامی نارەوەن ئەداتەوە/ مۆبایل))
خدر: ١- زۆر سوپاس نارە خان گیان، بەخوا وا هەر لەبەر دەرگاین ناهێڵن بچینە ژوورەوە.. بەس ئەڵێن شوکر مەترسیی لەسەر نییە، هەر وردە شووشەی بەرکەوتووە .......... ٢- نارەخان گیان سوپاست ئەکەم، کچێ زیانێکی زۆریشی بە کوڕەکانت و خاوەن بیناکە گەیاندووە، ئەی خۆ ئەبێ ئەوە ببژێرین، خۆ هەر خۆی نییە، کەتنەکەی زۆر گەورەیە.......... ٣- کچێ ئەوە چۆن ئەبێ نارەخان؟ تۆ بۆ خەسارەبژێریی برازام بیت؟ مەحاڵە قبوڵی بکەم ......... ٤- ئەها تێگەیشتم، باشە گەورەم، سبەی قسە ئەکەینەوە.. خواحافیزت بێ...... ٥- خواحافیز.
ــــــ Cut ـــــــگەڕانەوەی هەیە

دیمەنی – ١٥٤ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٧ – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن بە تەنها لە هۆڵەکەدایە، پاش کەمێک تافان ئەگەڕێتەوە لای))

هەندرێن: مناڵەکان نوستن؟

تافان: نا جارێ، ئیتر وا لە جێگەدان، دایکی بمرێ باڵا زۆر نەخۆشە.

هەندرێن: جا ئەم دایکەی بۆ بمرێ؟ هههە نەخۆشەو چاک ئەبێتەوە، بەس کە دایکی بمرێ ئیتر چاک نابێتەوە.

تافان: دە چوزانم ئیتر وا زمانم ڕاهاتووە.

هەندرێن: ئاخ زمان!! ئەو زمانە هەندێجار بەڵاو کارەساتی وا ئەقەومێنێ، لە چاوەڕوانیی هیچ کەسێکا نەبێ.. تۆ حەکایەتی پاشاو زمانلوست بیستووە؟

تافان: نا نەمبیستووەو بۆشم مەگێڕەوە.. تۆ پێم بڵێ ترسی چیت لە کاک ڕێشار هەیە؟

هەندرێن: ژنەکە ئەمانە سڵ لە هیچ ناکەنەوە.. من چەکل و پەکل و چڵێتەکان باش ئەناسمەوەو خەڵکیش ئەزانێ کێ خانەدان و وەجاغزادەیەو کێ تازەپیاکەوتوو و چڵێتە.. ئەمجۆرە کەسانە هەر ئەوەندەی پۆستێک یان برێ پارەی مۆڵیان بەخۆیانەوە شک برد، ئیتر بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، ئەبن بە کەسێکیتر.. ئەیانەوێ وەک خانەدان خۆیان نیشان بدەن، کەچی ورد ورد ناکەس بەچەییان لێ هەڵئەوەرێ.. پڕ ئەبن لە غرورو خۆ بەزلزانین.

تافان: یەعنی کاک ڕێشار چڵێتە؟

هەندرێن: هەر زۆریش.. ئەی خۆ وەجاغزادەش نییە؟ هههە.

Cut

دیمەنی – ١٥٥ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٥٣ – بەرفریاکەوتن:

(( خدر لە دەرگای فریاکەوتنەوە دێتە دەرەوە، خەڵکێکی زۆری لێیە، ئامازەی ڕۆستەم و سالم ئەکا بێنە لای))

ڕۆستەم: وەزعی چۆن بوو؟

خدر: ئەو زۆر باشە، لەمنەوە دوور بن تا تەکسیەک ئەگرم، نەک کاک زوبێریش بەهۆی کوڕەکانی کاک دارەوانەوە بێت.

سالم: کورە کاک دارەوان خۆی نەهاتووە، زوبێری چی؟

خدر: هەر وریابین باشترە، با نەزانن یەک ئەناسین.

ڕۆستەم: دەی باش.

(( خدر تەکسیەک ئەگرێ و ئەوانیش سەرئەکەون))

Cut

دیمەنی – ١٥٦ – ش/ د – بەرماڵی دارەوان:

(( دارەوان و کوڕەکان بە دوو سەیارەی بەرودوا دێنەوە.. سەیارەی دارەوان شتێکی ئاساییە، نەخراپ نەباش، دارەوان دائەبەزێت و ئاماژەی کوڕەکان ئەکا بێن بۆ لای، پێش ئەوەی سەیارە بخەنە گەراجەوە، ئامۆو ئاوا دێن))

دارەوان (( هەر لەناو سەیارەکەیەوە)): بیرم نەبوو لای دایکتان باسی بڕی خەسارەتەکە مەکەن، بڵێن شتێکی ئەوتۆ نییەو نازانین چەند دەرئەچێ، هەر یەک دوو کارتۆن شکاوە هیچ نییە.

ئامۆ: ئەرەوەڵا بزانێ چەندە، مێشکمان ئەبا.

ئاوا(( سوعبەت)): ئینجا دەمو چاوی خۆیشی ئەدا بەیەکاو پەستیەکەی بۆ ناڵێین؟ پەستییەکەی!! هههه

دارەوان: ئا ئا زۆر لەسەری ئەڕوا.. دەبیبەنە گەراجەکەوە با منیش بیهێنم.

(( ئاوا سەیارەکەی ئەباتە گەراجەوەو دارەوان بەدوایدا))

Cut

دیمەنی – ١٥٧ – ش/ن – ماڵی حەمەخدر:

(( خدرو ڕۆستەم و سالم ئەگەنە ژوورەوە))

خدر: ئێوە دانیشن با من چایەکتان بۆ لێنێم.

سالم: وەڵا وەختی چا نییە، پەلەکە بزانین ماموٚستا کێی ئەوێ بوٚی بکوژین؟

خدر: دەی زۆر باشە خەریک بوو ئەوەمان بیرچێتەوە کە بۆی هاتووین هههه.

(( پێکەنین و خدر نامە بە تیپ پێچراوەکە دەرئەهێننێت و بە مقەست یان چەقۆ هەڵیئەپچڕێت و نامەکە ئەخوێنێتەوە، تەنها ناوی کەسەکەی لەسەر نوسراوە.. خدر زۆر ئەشڵەژێ و تێک ئەچێ))

خدر: کێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێی؟؟؟؟

ڕۆستەم: بۆ وا تێکچووی؟ کێی لێ نوسراوە؟

(( خدر هەر بێدەنگە کەمێک))

سالم: کێییە برا؟ خۆ ناڵێ حەمەخدر بکوژن؟ بۆ وا شڵەژای؟

خدر(( بێتاقەت)): نا.. شڵەژانەکەم لە ناپاکیی و دووڕوویی ئەم خەڵکەیە.. ئەڵێ تریفەی کچی دارەوانم بۆ بکوژن.. ئاخر ئەوە شەریکی خۆیەتی و دواتریش دیارە خۆی پرسەکەی بۆ بەڕێوە ئەبا.. کەچی من وامئەزانی کەسێکی زۆر نەجیب و خانەدانە!!!

ڕۆستەم: دیارە شتێکی تیایە، ئەگینا بۆ ئەو؟

سالم: ئێستە بیکوژین یا پارەکەی بۆ بنێرینەوە؟

خدر: بە ڕای من ئێوەش لەم پیاوە دوورکەونەوە، ڕەنگە دوای ئەوەی ئیشەکەتان پێ ئەکا، ئێوەش بکوژێ بۆ شاردنەوەی نهێنییەکە، دوورکەوتنەوە باشترە.

سالم: وەڵا من ئەو نیعمەتە باشە لەدەست خۆم نادەم و تۆش ڕێگەم بۆ دانەنێی، یەکێکیتر ئەدۆزمەوە. دوای ئەوە کوشتنی کچێکی داماو چییە؟ ئیتر نازانم بۆ ڕۆستەم.

خدر: دە بڕۆ بەڵکو سا ئەمە خوایە بەسەر تاوانەکەوە بگیرێیت و ملت بکرێ بە پەتەکەیا.. بۆ ڕۆڵە تۆ وا ئەزانی خەڵک کوشتن وەک باسکردنی ئاسانە؟

ڕۆستەم: ڕاستییەکەی حەمەخدر، منیش لەگەڵتانیم.. ئێمە ئەو پارەیەمان لە خەویشدا بە خۆمانەوە نەبینیوە، ئێستا تۆ ئەتەوێ لەدەستمان بچێ؟ نا کاکە نا، ئەوەی لەسەر تۆیە ڕێگەو جێگەی کوشتنەکەیمان بۆ دانێی، تۆش نایکەی هەر خەڵک زۆرە.

سالم: ئێمە پرس و جۆ بە تۆ ناکەین، کە ئیشەکە بیکەین یان نەیکەین، نەوەڵا، تۆ نازانی ئەم پارەیە چۆن ژیانی من ئەگۆڕێ؟

خدر: دەی کە ئێوە هەر سووربن لەسەر کردنی، منیش نامەوێ ئێوەو پارەکەشم لەدەستچێ، وەرنە پێشەوە، با پێتان بڵێم چۆن سەرەتا لە چاودێریی کردنییەوە دەست پێ بکەن.

(( کۆ ئەبنەوەو خدر قسەیان بۆ ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٥٨ – ڕ/ د – کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان لەسەر قەنەفەیەک و زوبێر لەسەر مێزو کورسییەکەی))

دارەوان: جا ئەوە بەشەکەی ڕێشارو هەموو خەرجییەکانی تریشم لێدەرکردووە، ئینجا ئەوەندەی خێر کردووە.. بەڕاستی قەت چاوەڕوانی ئەوەم نەئەکرد! هەرچەند کاکی حەماڵ هەموو بەشەکەی منی زایە کرد بە شکاندنی سورەیاکان.

زوبێر: نا.. نا، دیار بوو ئیشێکی بەهات ئەکەوێتەوە.. لەوەشا کێشە نییە، شتێکت بۆ ئەگێڕمەوە لەبەر خەسارەتەکەت.

(( دارەوان تەماشای فایل و ئەوراقەکان ئەکات و زوبێر سەرنجی ئەدات))

<u>زوبێر مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

هەی بەد نمەکی هیچ لەبارا نەبوو، چەند پیس و دڵڕەشیت؟.. تۆ تەماشا چۆن خۆیم لێ ئەکا بە دۆست و برا؟ تۆ کە بتەوێ کچەکەم بە داخ و خەفەتەوە بکوژی دۆستایەتیی چیم پێ نیشان ئەدەی؟ چی لە پارە بکەم، کە بزانی کچەکەم لەگەڵ یەکێکدا پەیوەندیی هەیە، بە من نەڵێی!! لەولاوە بچی خۆشەویستەکەی بفڕێنی، تا بەداخەوە کچەکەم بمرێ.. ئەمە تەنها لەبەرئەوەی ئەتزانی کە کچەکەم دڵی لاوازەو نابێ خەفەت بخوا ئەگینا ئەمرێ؟ ئەوە من کچەکەمم گەیاند بە خۆشەویستەکەی و دڵیم شاد کردو هەموو شتێ بڕایەوە.. (( دارەوان تەماشای زوبێر ئەکا کە خەیاڵ بردوویەتیەوە)) ئینجا ببینە چۆن کچەکەت لە خوێنی خۆیا بۆ ئەگەوزێنم.. هەر ماوەیەکیتر ئارام بگرە، من یارییەکە بە پێچەوانەی خواستە گڵاوەکەتەوە هەڵئەگێڕمەوە.. گەر وا تێگەیشتبی کە بتوانی یاریی گڵاو لە بارەکەدا بکەیت و ئیشی خۆت مەیسەر کردبێ و سوودت لە بێتاقەیی من بۆ کچەکە وەرگرتبێ، ئەوە بزانە زۆر هەڵە تێگەیشتووی نادارەوان، تا سەر ناتوانی یارییم پێ بکەی.. ناتوانی، زۆررررر هەڵەیت.

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە تەواو</u>:

دارەوان(( پێکەنینی نەرم)): زوبێر زۆر دوور ڕۆشتبووی؟! هههه

زوبێر: دالغەم لای کچەکە بوو، بڕوا ماڵەکە چۆڵ ئەبێ.

دارەوان: ئەی بۆ نایانهێنیتە لای خۆت؟

زوبێر: بیرم لای شتێکی ئاوایە.

دارەوان: خەڵکێکی زۆر وا ئەکەن، بە تایبەت ئەوانەی کە دایک و باوکیان تەنیا ئەکەون.

زوبێر: من نازانم بۆ ئاسایی بێت ژن بچێتە سەر ماڵە خەزوران، بەس پیاو نابێ بچێ؟

دارەوان: جا کێ ئەڵێ نابێ؟ هههە هەر لە ئاساییی ئاساییترە.

Cut

دیمەنی – ١٥٩ – ڕ/ د – نزیک کۆمپانیای ڕێشار:

Mute

(( نارەوەن لە شوێنێک لە ناو سەیارەکەیدا وەستاوە.. چاو بۆ خدر ئەگێڕێ.. سەرەتا ئەبینێ تافان ئەچێتە کۆمپانیاکەوە، زۆر لێی ورد ئەبێتەوە، پاش کەمێکیتر کرمانج دێتە دەرەوە، لەو کاتەدا بێستان دەرەو کۆمپانیا ئەچێ، زۆر سەرنجیان ئەدا، کە کرمانج و بێستان بە یەک ئەگەن، کەمێک ئەوەستن بە بێ تەوقە کردن، و دواتر کرمانج بۆ لای سەیارەکەی و بێستان بۆ کۆمپانیا ئەچێت... نارەوەن تەلەفون ئەکا، بۆ ماوەیەکی کورت، لەگەڵ خدر و ئەوەندەی پێ ناچێ، خدر بە ڕاکردن دێت و نارەوەن ئاماژەی ئەداتێ سەرکەوێت.. خدر سەرئەکەوێ))

——— تابع ——————— Cut ————————

دیمەنی – ١٦٠ – متبوع – ڕ/د – ناو سەیارەی نارەوەن:

(( حەمە خدر و نارەوەن لە سەیارەکەدا ))

نارەوەن(( دەم بە گلەیی)): ئەوە ماڵم ئاوا کردی بۆ هیچ دەنگێکت نییە، نابێ هەواڵێکم بدەیتێ؟! خۆ لەو ڕۆژەوەی وتت هەندرێنیش چووە کۆمپانیاکەوە، ئیتر دەنگت نەماوە.. پێم بڵێ برازاکەت چۆنە؟

خدر: برازاکەم باشە، پاککراوەتەوە، بەڵام ئەو زیانەی بە کوڕەکانتی گەیاندووە، زۆر زۆرە.

نارەوەن: ئەی ئەمشەو لەماڵەوە وتیان هەر یەک دوو کارتۆن شکاوە هیچ نییە ؟

خدر: دیارە نایانەوێ تۆ بزانی، تۆش قسە مەکە کە زانیوتە، با ئەمەش هەر لە نهێنییەکانی نیوانمان بێ.

نارەوەن: باشە.. ئەی چەندە؟

خدر: زۆر زۆر.. بەڵام خوا هەڵناگرێ کاک دارەوان وتی، گرنگ ئەوەیە کوڕەکە سەلامەت بێ، زەرەر هیچ نییەو خۆم ئەیبژێرم.

نارەوەن: چۆن؟ چۆن؟

خدر: بەڵێ هەمووی خستە ئەستۆی خۆی.

نارەوەن: ئۆووو؟!!! ئەوە بەڕاستتە؟

خدر: بەڵێ، چاکەیەکی گەورەیە.

نارەوەن: دارەوان دڵی باشە.. سەروچاوی وەک ڕەزیل دەرئەکەوێ، ئەگینا جەوهەری خۆی وا نییە.

خدر: ڕاستیەکەی من تۆقیبووم، لەخوا بەزیاد بێ باش شکایەوە.

نارەوەن: ئەی دەنگ و باس؟

خدر: ئەچن بۆ سەر مەرز لەگەڵ کچەکان و ڕێشارو کچێ هەموویان، جا کێ نا؟

نارەوەن: ئەها تۆ بڵێ بەزم و کەیف و سەفا دەستی پێکرد.!

نا نا گومانت خراپ نەچێ.. منیشیان ئاگادار کردەوە لەگەڵیانا بچم.

نارەوەن: زۆر باشە، لەوێوە دەقە بە دەقە هەواڵم ئەدەیتێ تێگەیشتی؟

خدر (( خەندە)): ئەڵێی پۆلیسی دوایان کەوتووی هەهە

نارەوەن: تۆ ئەوە بۆ من ئەکەیت و ئیتر هەقت نابێ بە سەرەوە، بەخوا تێنەگەم ئەو دووەیان بۆچییە دڵم ناحەوێتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٦١ – ڕ/ د – قاوەخانەی تریفە:

(( لە میوتیدا.. سالم و ڕۆستەم، لە نیوەڕۆدا لەوێ دانیشتوون، جاروبار دیقەتی تریفە ئەدەن و جاروباریش بە هێمنیی چاو ئەگێڕن بۆ کرێکارەکان و خەڵکەکەو بە هێمنیی چپەیەک بە گوێی یەکدا ئەکەن، خواردنەوەیەکیان لەبەردەمدایە وەک شەربەت یان قاوەو نیسکافەو چا.. ڕۆستەم ئەچێت و لەگەڵ تریفە قسە ئەکات، تا نزیکیی کۆتایی قسەکانیان میوتییە.. دواتر....))

تریفە: جا بۆ ئەرکت کێشا براکەم، هەر بە شاگردەکانت بووتایە بۆیان ئەهێنای، وەک هاتی بەسەرچاو ئێستا پێیان ئەڵێم، بەس کەمێکی پێ ئەچێ، ئاساییە؟

ڕۆستەم: ئاساییە..... (( وەک دواتر بیەوێ ناوی بڵێ، بەوجۆرە ئاساییەکە ئەڵێ ))

تریفە: تریفە.

ڕۆستەم: ئاساییە تریفە خان، بە ئیسراحەت.

(( ڕۆستەم ئەگەڕێتەوە بۆ لای سالم و تریفەش شاگردێک بانگ ئەکات و ڕایئەسپێرێ بۆ خواردن و ئامادەی مێزەکەی ئەوان ئەکات ))

Cut

دیمەنی – ١٦٢ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆ تەلەفون ئەکا ))

سەرکۆ: نا نا نا نەکەی، خۆت نەچی.. خۆت ناسراویت، هەر بتبینن هەموو شتێک لە گرێژنە ئەچێ..... ئا، با زۆر وریا بن، هیچ هەواڵێکت نادەنێ تا هەموو شتێک تەواو نەبێ......... بەڵێ وریابن لە کارمەندەکانی گومرگەوە نزیک بن لە کاتی پشکنیناو خۆیان تەنها سەرنج بدەن، هیچیتر...... سبەی دەرئەچن؟ .... باشە بەسەرکەوتوویی... دەستتان خۆش بێت نەقیب ڕاهۆز.

(( سەرقاڵی تەلەفونیتر ئەبێت بە لاوەکیی ))

Cut

دیمەنی – ١٦٣ – ڕ/ د – شەقامێک:

(( خدر لە سەیارەکەی نارەوەن لە شوێنێکی دووری بازاڕ خواحافیزیی لە نارەوەن ئەکات و دائەبەزێ، لە پشتەوە ڕائەمێنێت و دیقەتی سەیارەکەی ئەدات تا لە چاو ون ئەبێ ))

<u>خدر مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

(( ئای داماو! بەو سادەییەی خۆتەوە ئەتەوێ لە شەڕی ئەژدیهاکانا پشکێکی سەرکەوتنت بەرکەوێ.. ڕەنگە سەرکەوتنی تۆ تەنها دڵخۆشییەک بێت، کاتێ ئەوەی خەڵکیتر نایزانێ، تۆ بە فزوڵیەت و سەراسیمەیی خۆت بیگەیتێ.. نازانی لەناو ئەم هاتوچوونەدا، ئەژدیهاکان بە بێ ئەوەی بیر لە دایکایەتیت بکەنەوە، دەست بۆ هێڵە سوورەکان ئەبەن.. جا کێ ناڵێ بیر لە کوشتن یان زیان پێگەیاندنی ئەمیش ناکەنەوە؟.. بەڕاستی ژنێکی باشە، زۆر شیرین و بە هەڵوێستە........ ئەی تۆ چی بۆ ئەکەی خدر؟............................ (( کەمێک وەستان)) من بە ژیانی خۆم لە ئازار پێگەیاندنی ئەیپارێزم.... ئافەرین حەمەخدر، ئەو کەم نییە بۆ تۆ، ئەوە بکە.... بەڵێن بدە..... بەڵێن بێ بیپارێزم.))

مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:

دیمەنی – ١٦٤ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ڕێژوان:

(( سەلوا لەناو سەیارەکەی ڕێژواندایەو ڕێژوان لە دەرگای سەکنەوە لای سەلواوە دەرگای کردووەتەوەو سەری دەرگاو سەقفەکەی گرتووەو خۆی بۆ سەلوا نوشتاندووەتەوە لە کاتی قسە کردنا ))

ڕێژوان: ئەی چی بکەین چاوەکەم؟ ئا چارەسەرێکیتریش هەیە، ئیتر یەک کێشە چییە نامێنێ.

سەلوا: ئادەی!

ڕێژوان (( پێکەنین )): وەڵا مەگەر ژن بە ژن بکەین، منیش دایکم بدەم بە باوکت و هەستینە سەرپێ هههههە.. (( سەلوا سەربائەدا بە پێکەنینەوە )) ئەی بڵێم چی؟ چی لەم دوو ملۆزمە بکەین؟

سەلوا: ئەی ئەکرێ هەروا چاوەڕوان بین؟ جا خۆ مەگەر یەکێکیان بمرێ! هههە ئەگینا هیچ چارەسەرێکیتر نییە.

ڕێژوان: دەی هەروای لێ ئەکەین.. خانویەکی گەورە ئەکڕین، جێی دایکم لە لایەک و باوکت لە لایەکیترەوەو خۆشمان لە نێوانیانا.

سەلوا (( پێکەنین )): جا بۆ خۆمان لە نێوانیانا؟ هههە سیقە نییە؟

ڕێژوان: کچێ ڕاستت بوێ نەوەڵا ئەو پیرانە خەتەرن، بەخوا باوکت بە دوو قسەی لووس دایکم لە خشتە ئەبا هههههە!

سەلوا: بەخوا ڕاستەکەی ئامانیان نییە.. نا، من شتێکیتر بە مێشکما هاتووە، بزانم چۆن ئەبێ؟

ڕێژوان: ئادەی بزانم!

سەلوا: خۆی لە ڕاستییا مەحاڵە، بەڵام با هەر قسەیەکی تیا بکەم باشترە.. جارێ لێبیگەڕێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٥ – ڕ/ د – بەردەمی زانکۆی تیرۆژ:

Mute

(( تیرۆژ دەرئەکەوێت و دوو کچی هاوڕێی لەگەڵدایە، بەرەو شوێنی پاسەکان ئەچن وەک ڕۆژانیتر، تایەر کەمێک نزیکی ئەو شوێنە چاوەڕوانی ئەکا، کە ئەبینێ دوو کچی لەگەڵە، تووڕە ئەبێت.. کە لە تایەر تێپەڕ ئەبن، تیرۆژ ئاوڕ ئەداتەوەو زمانی لێدەرئەهێنێ وەک پێ ڕابواردن.. تایەر زیاتر تووڕە ئەبێ))

Cut

دیمەنی – ١٦٦ – ڕ/ ئێوارە / ن – چایخانەکە:

(( تەنها ئەردەڵان و هاوڕێی لێیە))

ئەردەڵان: دەی باشە چۆن شەق نەبەم، هەر حەمەخدری ناموبارەک حەماڵە؟

هاوڕێ: کورە دە چی تیایە ئەو ئەڕواو شوێنەکە بۆ تۆ تەخت ئەبێ.

ئەردەڵان: کورە تەخت بوونی چی؟ خۆی ئەڕوا بۆ سەفاو مەرواو ئەحەو کارەی برازاشی لێرە جێ ئەهێڵێ ئیشەکان بماشنەوە.. منی نەگبەتیش ئەڵێی بۆم بڕاوەتەوە، ڕۆژیی دە هەزار دوانزە هەزار.. ئاخر توخوا ئاوا پیاو ئەژی؟

هاوڕێ: ئەحەی نەگبەت کوا هاتۆتەوە سەرئیش؟

ئەردەڵان: دەی ئەیبینی، ئەگەر بەو هەموو برینەوە نەیهێنایەوە، تۆ بە ناوی خۆمەوە بانگم مەکە.

هاوڕێ: ئەردەڵان گیان دە ئاخر مەسەلە هەر زمانە لووسەکەش نییە.

ئەردەڵان: بەرەووەڵا هەر ئەوەیەو هیچیتر نییە.. ئەی بەڕای تۆ چیتر هەیە؟

هاوڕێ: نا نا.. نا کاکە گیان، ئەو ئەڵێی دانی مارە، هەر ئیشێکی پێ ئەسپێرن هەر بڵێی یەک و دوو تەواو بووە، تۆش سست و خاو هەر ئەڵێ بەدوای تەزبیحی هەڵڕژاوا ئەگەڕێی.. دە تۆزێ خۆکەوە خۆ، ئەو جەستەیەت کرم تێی ئەدا برا.

ئەردەڵان: دە بڵێم چی؟ خوا نە سەروفەسساڵێکی جوانی دامێ، نە گورج و گۆڵیی و نە زمانی لووس و نە دایک و باوکێکی دەوڵەمەندیش.

هاوڕێ: تۆ هەموو شتێ ئەگێڕیتەوە بۆ قەدەری خۆت.. دەی کە وایە بۆ ناچی خۆت بکوژی و لە کۆڵ خۆت و ئێمەش ببیتەوە؟

ئەردەڵان: جا چ ڕێیەکم لە تۆ گرتووە نا هاوڕێ، دەی تۆش دەرمانکە لێرە.

هاوڕێ: دەرتناکەم حەددم نییە براکەم، خوتەخوتو بۆڵەبۆڵەکەت ببڕەوە.. کەمێک تین بدەرە بەر خۆت و گلەیی لە شانسی خۆشت مەکە.

ئەردەڵان: باشە، وەعد وا ئەکەم (( ئەچێتە دەرەوە بەگورج و گۆڵیی و هاوڕی دیقەت ئەدا ))

هاوڕێ: هههههه ئا ئا ئاوا زۆر باشە هههه.

Cut

دیمەنی – ١٦٧ – ڕ/ د – بەر کۆمپانیای ڕێشار:

(( سێ سەیارە وەستاوە.. سیارەیەکی بەرزی مۆدێل بەرز، ڕانج و لێکسز بێ باشترە، ڕێشارو کرمانج و سەرەو مالە لە نزیکیەوە وەستاون.. سەیارەیەکی بەرزیتر، بێستان و هەندرێن و تافان لە نزیکیەوەن... ئەویتریش حەمە خدر))

ڕێشار (( دێتە نزیکی هەندرێنەوە)): هەر کەسەو سەیارەی خۆی بناسێتەوە، تۆ ئیشت جەرد کردنە، فەرموو بچۆ لای حەماڵەکە سەرکەوە.

هەندرێن: وەڵا گەورەم وتم لەگەڵ تافانا پێکەوەبین.

ڕێشار: تافان لەماڵەوە ژنی تۆیە، لێرە کارمەندەو بەس.. سەرە ئەنێرم لە سەیارەکەی ئەواندا بێ، با ئاگای لێیان بێ... (( بۆ سەرە)) وەرە سەرە، وەرە سەیارەی کچەکانەوە. مالە تۆش لەگەڵ منا بە.. دەی سەرکەون.

(( هەموو بەڵێ باش ئەکەن و سەرئەکەون.. هەندرێن ئەچێتە لای خدرو سەرە بۆ لای کچەکان، کە لە دواوە سەرئەکەون و مالەش لە دوای ڕێشارەوە لە سەیارەی یەکەمدا.. خواحافیزیی لە کرمانج ئەکەن))

ڕێشار: وریای ئەمناوە بیت کرمانج.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٦٨ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( سەلوا، باڵاو کڵپە ئەگۆڕێ، جلی دەرەوە ))

سەلوا (( کڵپەی گۆڕیوەو ڕێکی ئەخا )): دەی باڵا گیان وەرە بۆ لای پوری خۆت، وەرە دەی ئەم بلوزەش جوانە، وا نا؟

باڵا: با جوانە.. ئەی کێ ئەمانبا بۆ مەکتەب؟

سەلوا: خەمی مەکتەبەکەت نەبێ عەیار! ئێستا ئەچین بۆ ماڵی خۆمان و نیوەڕۆش ئەتانبەم بۆ مەکتەب، جلی مەکتەبیش ئەبەین.

کڵپە: ئەی بۆ هەر لێرە نەبین؟

باڵا: دە توخوا پوورە سەلوا با هەر لێرە بین، ماڵی ئێوە زۆر ناخۆشە.

سەلوا: ئەی باوەگەورە گوناحە تەنیایە، کەس نییە ئاگای لێی بێ.

باڵا: باشە هەرچیەکی ویست خۆم بۆی ئەکەم.. باش؟

سەلوا بەسەرچاو.

کڵپە: ئەی ئاگرینی دراوسێتان لە مەکتەبە یان لە ماڵەوە؟

سەلوا: وەڵا نازانم. با بگەینە ئەوێ بچۆ بۆ لای... دەی با بڕۆین ماڵەکەمن.

(( ئەچنە دەرەوەو دەرگا دائەخەن ))

Cut

دیمەنی – ١٦٩ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( بروسک خەریکی ڕێکخستنی بۆینباخ و جلوبەرگە.. چیمەن بە چاوی خەواڵوو و سەروقژی ژاکاوەوە دێتە دەرەوە))

چیمەن: زوو نییە بروسک گیان؟

بروسک: زووی چی چیمەن گیان، سەعات دەیە. باوکت دەمێکە ڕۆشتووە.

چیمەن: ئۆوو وەڵا دەرەنگە.

بروسک: هەر تورەش نەبێ باشە؟!

چیمەن: نا کەس لە تۆ توورە نابێ هەناسە!

بروسک: ئیتر ئەبێ وا ڕابێین لەگەڵ ئەودا بڕۆم.

چیمەن: نا، ئەم ماوەیە گوێی ناداتێ، ئیتر ئیشی تازەیە، هەتا ڕایەیت پێی ئەچێ.

بروسک: باشە دڵەکەم، جارێ بای، زوو دێمەوە بۆ کفتەکە، بتبینم چۆن دەمودەستی پێوە بخورێ.

(( بروسک دێتە دەرەوەو خواحافیزییان))

Cut

دیمەنی – ١٧٠ – ڕ/ د – بەردەم ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن مۆبایلەکەی بە دەستەوەیە، دارەوان بەڕێ ئەکا ))

دارەوان: بۆ بەردەگاکەش مۆبایلت لە دەست نابێتەوە؟

نارەوەن: جا هیچ پەیوەندیی بە تۆوە هەیە؟ هەهە

دارەوان: چک.. بۆ ئارامیی خۆت وتم.

(( گێلاس دێتە دەرەوە خۆی گۆڕیوەو سواری سەیارە بێت ))

نارەوەن: تۆ هەقی ئەوەت نەبێ، بڕۆ بەلای ئیشتەوە، خواحافیزت بێ.

(( گێلاس سڵاویان لێ ئەکات و دواتر دارەوان ئەڕوات، گێلاسیش ئەیەوێ سواری سەیارەکەی بێت ))

نارەوەن: ئەوە خێر گێلاس خان بەم بەیانییە زووە، ئۆغر بێ؟

گێلاس: وەڵا کوڕەکەی سپیدەی کچم نەخۆشە، سپیدە تەلەفونی کرد بیبەین بۆ خەستەخانەیەک.

نارەوەن: ناشوکریی نەبێت خەستەخانەی چی؟ هەر شروبێکی ئەدەنێ و بەڕێی ئەکەن.. بە قسەی من ئەکەی بیبەن بۆ ئەهلییەک.

گێلاس: ئەی ئەوانیش خۆیان ئەزانن چۆن وا بکەن خەڵک ڕوو بکاتە خەستەخانە ئەهلییەکان، تازە وای لێهاتووە.

نارەوەن: ئەک ناوجەرگیان بە ئاو بێت، خەستەخانەی ئەهلیی و خوێندنی ئەهلیی و تەلەفونی ئەهلیی و گواستنەوەی ئەهلیی و کچێ هەر هەوای ئەهلیی ماوە.

گێلاس: کچێ هەر لێیگەڕێ نارەوەن خان، هەمووی بوو بە ئەهلیی.. توخوا ببورە ئەبێ بڕۆم، دڵم لایەتی.

نارەوەن: باشە لە ئامانەتی خوادا بی گێلاس خان گیان.. (( گێلاس ئەڕوات و نارەوەن بە لاسا کردنەوە)) ئەبێ بڕۆم دڵم لایەتی، کەس کوڕی نەبوو کچی ئەم نەبێ، ئەک عەمرت نەمێنێ بۆ خۆت و چ ژنێکی، خۆ بەجێی هێشتم... تۆ داخی ئەم خدرەش تەلەفونێ ناکا!!! خوا ئەزانێ ئێستا گەیشتوونەتە کوێ نەگەیشتوون، کێ لەگەڵ کچەکانە کێی لەگەڵ نییە... ئەوە لە ڕووشم نایەت بڵێم ئەگەر ڕێشارە لوتسڕ چاوباشقاڵیی لەگەڵ کردن وابکە بە مۆبایلەکەت ڕەسمیانم بگری.. ئەی خۆ خۆی بەشەرە، ئەزانێ بۆ پارەی ئەدەمێ.

(( نارەوەن بەدەم تەماشایەکی تری مۆبایلەکەوە ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٧١ – ڕ/ د – چێشتخانەیەکی سەر ڕێگا:

(( هەموو پێکەوە دانیشتوون بۆ نانخواردن.. بێستان و تافان لەسەر مێزی ڕێشار.. سەرەو مالە بە جیا، خدرو هەندرێنیش لەسەر مێزێکیتر.. شۆفێریش بە جیا ئەگەر هەبوو.. لە میوتیدا خەندەی کچەکان و ڕێشار وەک نیشانەی دڵخۆشییان پێوە دیار بێ، سەرەو مالە نانی خۆیان ئەخۆن و سەرنجیان لەسەر کەس نییە.. هەندرێن نان ئەخوات و جاروبار دیقەتی تافان ئەدات.. خدریش بە پەلە نان ئەخوات و تەواو ئەبێ، نوکەیەکی بۆ دێت پێش تەواو کردنی نانخواردنەکەو ڕەنگی تێک ئەچێ.))

هەندرێن: خاڵە نوکەشت زۆر بۆ ئەکەن؟!

# (( ئەڵقەی نۆ ))

خدر: توخوا ئەوە پورێکمە کاک هەندرێن، کەنتۆرێکی کڕیوە بڕیار وابوو ئەمڕۆ بۆی بگوێزمەوە، ئەم سەفەرەم هەر لە بیر نەبوو.. ئینجا ڕەزیلیشە، دڵی نایەت حەماڵێکیتر بگرێ، ئەوە جاروبار نوکە ئەکاو بیرم ئەخاتەوە، ڕاستیەکەی منیش نازانم بڵێم چی، بۆیە بۆی ناکەمەوە.

هەندرێن: پێی بڵێی ئەمڕۆ لە دەرەوەی شارم باشترە، با هیچ نەبێ ئەمڕۆ دەستخەڕۆ نەبێ.

خدر: وەڵا ڕاستەکەی، دەباشە من تا سەرئاو ئەچم و لەوێشەوە پێی ئەڵێم. (( هەڵئەسێت و ئەچێ بۆ توالێت))

______ تابع ______________________ Cut ______________________

دیمەنی – ١٧٢ – متبوع – توالێتێک لە دەرەوەی چێشتخانەکە:

(( خدر تەلەفون بۆ نارەوەن ئەکا))

خدر (( بە دەنگی نزمو کەمێک ازعاج)): **١-** ئەرێ ئەوە ماڵم ئاوا کردی، ئەو هەموو نوکەیەت لە چییە؟ خۆم وتم ئەگەر شتێک هەبوو تەلەفونت بۆ ئەکەم..... **٢-** نا نا حەددی ئەوەم نییە نارەخان گیان.. بەس بەخوا هەموو چاویان تێبڕیوم، ئەڵێن ئەو هەموو نوکەیە چییە بۆت دێت؟........ **٣-** توخوا لێممەگرە نارەوەن خان، بەخوا ڕەنگە ئەوان گومانی ئەوە بکەن پەیوەندییم بە پۆلیسەوە هەبێ، کاکە لە خۆیان ئەترسن.... **٤-** جارێ هیچ، بەس کاک ڕێشار کچەکانی بردۆتە سەر مێزەکەی خۆی بۆ نانخواردن و زۆر مورتاحە..... **٥-** نا خۆ ڕەنگە واش نەبێت، با بزانم هەرچییەکی تر ڕوویدا خۆم تەلەفونت بۆ ئەکەم نارەخان گیان، ئەگەر نەمکرد مانای وایە هیچ دەرفەتێکم نییە، باشە چاوەکەم؟ .... **٦-** باشە بەسەرچاو، جارێ خواحافیز، با دوا نەکەوم..... **٧-** خواحافیز.

________ Cut ________

دیمەنی- ١٧٣ – ڕ/ د- حەوشەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن تێل بۆ خدر))

نارەوەن: **١-** ئا ئا ئا ئەوە چییە خدری ناموبارەک؟ ئەی بۆ لە مۆبایلەکەوە نایەیتە دەرەوە دوو شەقیشمان تێ هەڵدەی.. تۆ سەیریکە خۆ ئەڵێی مێردمە؟!.... **٢-** چاوی تۆش و ئەوانیش دەرئەهات، هەموو نوکەی چی؟ هەر چوار یا پێنج جارم کردووە، ملت شکێ یاخوا... **٣-** هههە کورە پۆلیسی چی؟ دەی پێم بڵێ چی ڕوویدا؟... **٤-** کورە خۆم هەر وتم شتێکی تیایەو ئەو ڕێشارە بێناموسە بە خۆڕایی نەیبردوونەتە لای خۆی.. وەڵا مادام ئاوایە، ناهێڵم تریفەی کچم یەکجاریتر مەرحەبای ئەو بێستانە بکا.. حەی حەی! .... **٥-** کورە وایەو ئەوولاتریش، من ئەوەندەم بەس بوو، باشە ئیتر نوکەت بۆ ناکەم، بەس ئەگەر تێلیشت بۆ کردم، ئاگات لە خۆت بێ بەساقە، نەزانن لەگەڵ من قسە ئەکەی..... **٦-** خواحافیزت بێ بەساقە، خوات لەگەڵ.

________ Cut ________

دیمەنی – ١٧٤ – ڕ/ ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو دارەوان و بروسک دانیشتوون.. ڕێژوان بە هەڵەداوان دەستێکی بە دەرگاوەو خۆی دێتە ژوورەوە))

ڕێژوان: باوکە باوکە مامە ڕەحیم مرد!

زوبێر (( زۆر کەم بیرکردنەوەو سەرسوڕمان)): مامە ڕەحیم کێیە کوڕم؟!

ڕێژوان: باوکی ئەو کاک هەندرێنەکەی بارەکەی بۆ هێنای.. من ئەچم بۆ ئەوێ فریایان بکەوم، کاک هەندرێنیش لە شار نییە. (( بە پەلە ئەڕوات))

دارەوان(( پێی سەیرە)): جا ئەم بۆ وا خۆی بۆ تێکداون؟

بروسک (( بۆ زوبێر)): مامە، ئەو مامە ڕەحیمە خزممانە؟

زوبێر: نا خزم نییە.

بروسک: ئەی بۆ ڕێژوان ئاوا شڵەژاوە؟ سەیرە؟!

دارەوان: منیش پێم سەیر بوو.

زوبێر: دارەوان خۆ تۆ لای خۆت دنیادیتەی دارەوان.. کە هەندرێن کاک بێ و باوکی مامە بێ، هەڵبەت کچیان هەیە.

(( دارەوان و بروسک پێئەکەنن، سەری بۆ ئەلەقێنن و زۆر ڕاستەی بۆ ئەکەن))

بروسک: کەواتە با منیش بچم هاوکاریی بکەم.

دارەوان: دانیشە ژنانی، تۆش لەبەر خاتری خاتران مەچۆرە پرسەیەکەوە نایانناسی، دواتر پێکەوە ئەچین لە مزگەوت سەرەخۆشیی لە ژنبراکەت بکە هههە.

(( پێکەنین))

———— گەڕانەوەی هەیە ———— Cut ————

دیمەنی – ١٧٥ – ڕ/ د – بەردەم دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( محە ناشوکر کەمێک خوارتر، بەدیار شتەکانییەوە دانیشتووە.. ئاوا لەبەر دوکانی خۆی لەسەر کورسییەک دانیشتووەو ئامۆ لە ژوورەوەو جاروبار دێتە دەرەوە ))

محە: وەرە ئاوای کوڕی دارەوان.

ئاوا (( هەڵئەسێت بەرەو لای دێت )): بەڵێ مامەمحە.

محە (( پاش گەیشتنی ئاوا )): تۆ پیاوێکی زۆر باشت لێدەرئەچێ.. ڕەنگە سامانی باوکت ببێ بە سایەیەکی باش بۆ ئێوە.. بەس ئەو نازانێ بیخوا.

ئاوا: چۆن وا ئەڵێی مامەمحە ؟ خۆ هەموو ڕۆژێك ماڵی ئێمە ئەڵێی جەژنە، بەخوا ئەوەی خەڵک پێی ئەڵێ خواردنی چەورو گەرم، ئێمە لەبەرچاومان کەوتووە.. نابینی من لێرە هەر فەلافل و نان و شووتی و نان و ترێ و قاورمە ئەخۆم؟

محە: بەوەش ئەڵێی زانین؟ کە هەموو جۆرە گۆشتێکتان لەبەرچاو کەوتبێ؟

ئاوا: ئەی مامەمحە گیان خواردن بە شتێک ئەوترێ بچێتە دەمەوە.

محە: ئاخر تۆش جارێ ئەقڵەکەت بۆشە، هەروا تێ ئەگەی.

ئاوا: ئەی ئەوە نەبێ چییە؟

محە: مەبەستم ڕێکخستنی سەروەت و سامانە.. با یەک شتت پێ بڵێم.

ئاوا: فەرموو.

محە: تۆو ئامۆی برات، قەت نازانن باوکتان چەندی هەیەو چەندی نییە، تا نەمرێ، یان لە کەسابەت پەکی نەکەوێ.

ئاوا: قەت خوا بەو ڕۆژە نەکا مامەمحە گیان تۆش دەمت باش ناهێنێ.. بەڕاستی ئەوەتا باوکم ئێمەی خستۆتە سەر سکەی خۆمان و خوا نەیبڕێ زۆر باشمان دەست ئەکەوێ، ئینجا چاویشمان لە سامانی ئەو نییە.

محە: کورم سامانی باوک هی منالّە.

ئاوا: ئەی چی بکەم؟ بچم بلّێم باوکە چیت هەیەو چیت نییە؟ دوای ئەوە من پێویستیم بە هیچ نییە تا سۆراخی سامانی ئەو بکەم.

محە: ڕەنگە زۆر نەبا بکەویّتە دەستی ئێوەوە، ئەی نابێ لێی تێبگەن؟

ئاوا: ئەک زمانت بە بڕێنچێ مامەمحە، من و تۆش هەردووکمان بەساقەی بین. باش؟

محە: تۆ ئا.. بەس من نا.. هەڵمەچۆ کوڕم، مەبەستەکەم بەیانیی و دووەی نییە.. مەبەستم هەر کاتێکە خوا ئەمانەتی لێوەربگرێتەوە، هەموو هەر نامرین؟؟؟؟

ئاوا: جارێ بۆ باوکم زووە.. پێش ئەو جارێ سەرەی تۆیە.. جا تا سەرەکە نەگەیشتۆتە سەرت، حەزت لە چییە بۆت بێنم؟ ئیتر ئەم شێرو ڕێویەم بۆ مەهێنەرەوە.

محە: سەرسواڵکەر ئەمڕۆ دەعوەتی کرمانجی لای ڕێشارم.. خۆشم پارەو پولی باشم پێکەوە ناوە.. بەڵام کە دەعوەت ببێ، بۆ نەیخۆم.

ئاوا: مەترسە، ناهێڵین بمریت لە برسا، ئێمە زمانمان خراپ نایهێنێ، وەک تۆ نیین.

(( ئاوا بەجێی ئەهێڵێ و ئەچێتەوە بەر دوکان))

محە: ئەمیش هەر کوڕی باوکە کەرەکەیەتی.

Cut

دیمەنی – ١٧٦ – ڕ/ د – مەرز:

(( خدر بەدیار بارێکەوە وەستاوە لە گومرگ کەشف ئەکرێ.. ڕێشار دێتە نزیکییەوە ))

ڕێشار: خدر وەرە لەگەڵما ئیشم پێتە.

خدر: بەسەرچاو گەورەم.

(( بە یەکەوە دێن بەرەو لای سەیارەکەی ڕێشار))

ڕێشار: ئابچۆ سەرەو ماڵە یەکێکیانم بۆ بدۆزەرەوە، با ئەویش بێت.

خدر (( گورج و گۆڵ)): بەسەرچاو گەورەم هەر ئێستا.

(( خدر بە پەلە شەرواڵەکەی هەڵئەکات و ڕائەکا.. ڕێشار ئەوەستێ))

ڕێشار (( لەبەر خۆیەوە)): ئەم هەتیوەم زۆر بەدڵە، قەت پرسیار ناکا، وەک ئەوانیتر نییە.

(( پاش کەمێک ماڵە دێت و لە میوتیدا ڕێشار پەلەیان لێ ئەکات و بە سەیارەکە هەرسێکیان ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٧٧ – ڕ/ د – مەرز/ بەردەمی سەیارەی کچەکانی تیایە:

(( بێستان و تافان لەناو سەیارەکە دانەبەزیون.. هەندرێن بەرەو لایان دێت... دیمەنی بارەکانی سەر مەرز نیشان ئەدرێ))

هەندرێن(( بێتاقەت.. ئەگاتە لایان و دەرگا ئەکاتەوە)): کاک ڕێشار ئەڵێ کوڕوکاڵی زۆر لێیەو ئافرەتیشی لێ نییە، ئێوە دامەبەزن، وا ئێمە خەریک ئەبین.

تافان: ئێ زۆر باشە.

بێستان: توخوا زۆرتان پێ نەچێ.. گۆت بووین لەناو سەیارەیا.

هەندرێن: وەڵا ئیتر ئیشە، بزانین چەندی پێ ئەچێ؟ دڵنیابە تەواو بین ناچین بەلای باری خەڵکا. (( هەندرێن ئەڕوا ))

بێستان: ئەوە چییەتی؟ خۆ بۆ باوکیشی پێت نەوتووە؟

تافان: نا.. هەر ئەوەیە، پێی ناخۆشە کاک ڕێشار ڕوومان ئەداتێ. کەیفی خۆیەتی.

بێستان: بۆ باوکی پێی بڵێ باشترە.

تافان: ئەوە بە ڕاستتە، ئێستا دنیا ئەهێنێتە سەیرمان و جەوەکەمان لێ تێک ئەدا، وازی لێ بێنە جارێ.. لە گەڕانەوەیا پێی ئەڵێم.

Cut

دیمەنی – ١٧٨ – ڕ/ن – قاوەخاکەی تریفە:

(( تریفە لە شوێنی خۆیەتی.. خورشید لە بەردەمیا وەستاوە))

خورشید: زۆری ماوە پێ بگا؟

تریفە: هەر ئێستا وا ئەچم کاک خورشید، هەروەکو جاران بیخاتەوە ناو کارتۆنەوە؟

خورشید: ئەی ١٥ پیتزا زۆر نییە بەدەستییەوە بگرم؟

تریفە (( پێکەنین)): با زۆرە، بەڵام گەر کارتۆنت نەوێ، پێیان ئەڵێم هەر بۆت بخەنە سەیارەکەتەوە.

خورشید: ناوەڵا ئاوا خۆشدەستترە، لەماڵیشەوە، هەروایان پێ خۆشترە.

(( یەکێک لەو دوو کەسەی ژوورەوە دوو کارتۆن ئاوی بۆ ئەهێنێ.. جوان بە تیپی ئاوی گەورە پێچراوە))

شاگرد: ئەوە پیتزاکەتە قوربان.

تریفە: ڕۆڵە بۆ ئاوا توند ئەیپێچنەوە؟ ئەی لە ماڵەوە چۆن بیکەنەوە؟

خورشید: وایە ئەمجارەیان زۆر خراپ جەڕێنراوە هههەه، گەر زەحمەت نەبێ بیخەیتە سەیارەکەوە، شاگردانەی خۆشت لێرە دائەنێم.

تریفە: بیبە کاکە بیبە..

(( لە میوتیدا، خورشید پارەکە ئەدات و ڕۆستەم و سالم لەوکاتەدا دێنە ژوورەوە، سڵاو ئەکەن و وەڵام و ئەوان ئەچن دائەنیشن... دواتر تریفە خۆی دێتە سەر مێزەکەیان))

تریفە(( بە نازێکەوە)): قوربان هەروەک ڕۆژان؟

سالم: بەڵێ.

ڕۆستەم: بۆ منیش هەروا.

تریفە: لە پێشا هیچ ناخۆنەوە؟

(( ڕۆستەم و سالم: سوپاسی ئەکەن و تریفە ئەڕوات بۆلای چێشتخانە))

ڕۆستەم: ئا ئەمە بخەیتە سەر چاوی کوێر چاکی ئەکاتەوە، کەچی ئەو پیرە کەڵتەکۆنە ئەڵێ بیکوژن.. توخوا گوناح نییە دەستمان بچێتە ئەو ناسک و نازدارە؟

سالم(( گرژ)): هێی کورە حەزت لێ نەکردبێ؟ ئێمە چیمان پێوتراوە ئەوە ئەکەین، جوانە جوان نییە، هەردوو چاوی دەرئەهات، پارەکە جوانترە بیرت بێ.

ڕۆستەم (( بە نابەدڵیی)): خۆ هیچ... هیچ!.. هەروا وتم.

(( ئەمان بە چپە ئەدوێن و جاروبار چاو ئەگێڕن و ئەوانیتریش بە کاری خۆیانەوە سەرقاڵن))

Cut

دیمەنی – ١٧٩ – ڕ/ ن – گەڕانەوە بۆ دیمەنی - ١٧٤ - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێر بە تەنها دانیشتووەو بروسک دێتە ژوورەوە ))

بروسک: فەرموو مامە گیان.

زوبێر: دانیشە.. (( بروسک دائەنیشێ)) بروسک هەرکات دەستت بەتاڵ بوو، سەرێکی ناو بازاڕەکە بدە.. سەرچاوەی ئیش و هەواڵ و جموجوڵی بازاڕ، وەک ئەڵێن چایخانەکەیە.

بروسک: ئەوی لای خۆمانەوە؟

زوبێر: ئا ئا.. ئەوی هاوڕێ.. خۆت بگونجێنە لەگەڵیانا، ئیتر باش ئاگاداری جموجوڵ و پەیوەندیی و شێوەی مامەڵەکردنی ئێرە ئەبی.. هەرچەند بە ڕێژوان ئەڵێم، ئەڵێ ڕووم نایەت.

بروسک: جا ئەوە گرنگە؟

زوبێر: لێرە تەنها ئیش و کار بوونی نییە، ئێرە بریتییە لە ڕەفتارو چەند هەڵسوکەوتێکی هاوچەشن لە نێوان خەڵکەکەی ئەم ناوچە بچووکەیا.. ئەگەر من و تۆ ئاگاداری ئەو زمانە هاوبەش و پەیوەندییە هاوبەشەیان نەبین، نامۆ ئەبین و بەوجۆرەش ئەبین بەژێر هەرەسی ئەم جۆرە کارکردنەوە.. قسەکانم ڕوونن.

بروسک: بەڵێ مامەگیان.. بەسەرچاو وا ئەکەم و هەر زۆر زوو تێکەڵیشیان ئەبم، هاوڕێی باشیشیان تیا ئەدۆزمەوە.

زوبێر: ڕێک ئەوەم ئەوێ.. سوود وەرئەگری لە حەماڵەکان و لەو چایچییەش، ئەوان سەرچاوەی قسەوباس و وتی وتین.

بروسک: ئەمر ئەکەی مامەگیان.

زوبێر: ئێستا بچۆرەوە سەر ئیشی خۆت. (( بروسک ئەچێتە دەرەوە ))

______ گەڕانەوەی هەیە ______________ Cut ________________

دیمەنی – ١٨٠ – ڕ/ د – بەردەرگای مزگەوت:

Mute

(( لافیتەیەک هەڵواسراوە، نوسراوە: [ دڵگرانین بە کۆچی دوایی هاوولاتیی عبدالرحیم محمد عبدالرحیم، باوکی هەندرێن و سەلوا، برای حاجی عبدالواحدو یاروەیس..کە دوای ململانێ لەگەڵ نەخۆشییەکی سەختدا، کۆچی دوایی کرد.. بنەماڵەی خوالێخۆشبوو] ڕێژوان لەگەڵ کەسێکیتردا لەبەردەرگا وەستاون و بەخێرهاتنی خەڵک ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ١٨١ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٧٩ –کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو دارەوان دانیشتوون))

دارەوان: بنێرم نانت بۆ بێت؟ خۆم ئەچم لە دەرەوە نان ئەخۆم، بزانم سەروپێیەک نادۆزمەوە؟

زوبێر: نا، ئەمڕۆ چیمەن پێی وتم ئەبێ بێیتەوە.. بەس سەروپێ خراپە دارەوان، وریای تەندروستیی خۆت بە، بۆ من و تۆ باش نییە.

دارەوان: شەش مانگێک ئەبێ نەمخواردووە، کەچی لە بەیانییەوە حەزی لێ ئەکەم.

زوبێر: دەی باشە عافێتت بێ، من تا عەسر نایەمەوە. (( هەڵئەسێ)) وا کاتیش درەنگ بوو، ئەبووایە بروسک پێی بووتمایە هههە.

دارەوان: بروسک زۆر مەشغوڵی ئیشە، ڕەنگە هەر بیری لای نانی نیوەڕۆ نەمابێ.

زوبێر: دەی باشە من ئەچم و لەوێوە ئەڕۆین.

دارەوان: باشە خواحافیزتان بێ.

زوبێر: خواحافیز.

(( پاش کەمێک دارەوان تەماشایەکی دەرەوە ئەکا بۆ دڵنیایی.. دواتر بە مۆبایل تێل ئەکا ))

دارەوان: ئێوە باشن؟ ...... دڵخۆشن؟.....

Cut

دیمەنی – ١٨٢ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن مۆبایلەکەی بەدەستەوەیەو دەستی خستۆتە پشتی، بە حەوشەکەدا دێت و ئەچێت.. پاش کەمێک زەنگی بۆ دێت))

نارەوەن: ١- بەڵێ خدر گیان.. ئەرێ ئەوە لە کوێی ماڵەکەم، خۆ من دیقم کرد....... ٢- هە ها هە هەواڵی چۆن چۆنی؟، یا الله خێر؟ ....... ٣- چی بووە؟ چی هەیە؟ خێرا پێم بڵێ دڵم تەقی ......٤- ئاوااااا؟ هەی لەو خوێڕییە، بە فرسەتی ئەزانێ لە چاوی خەڵکەوە دوورن.. بەخوا هەموو شتێکم وەک ڕۆژی ڕوون لا ئاشکرا بوو، خۆم ئەمزانی ئەو هەتیوە سەرسەرییە ئەیەوێ لە خشتەیان بەرێ...... ٥- کورە ئەوە بە پارەکەی ئەنازێ ئەو ناکەس بەچەیە، ئەیەوێ وای نیشان بدا کە ممنونیان نییەو ئەوان بە زۆر شەڕی پێ ئەفرۆشن.. ئەی ئەگینا دیارییان بۆچی بۆ ئەکڕێت؟ دیاریش چ دیارییەک ئەو کارتۆنە قەبانەی تۆ باسی ئەکەی.. ئەڵێی قورس بوون خدر گیان؟........ ٦- ئۆووو دووسێ کیلۆ ماکیاژ ئەزانی چی ئەکا؟....... ٧- باشە بەساقەوبم زۆر سوپاس.. ئاگات لەخۆت بێ، هیچ نەدرکێنی و با بە هیچ شتێکمان نەزانن، ئەگینا ئەمانکەن بە پۆڕی خوراو...... ٨- هەر دڵم لات بوو، ئاگات لە خۆت بێت...... ٩- چۆن خەمم نابێ بەقوربان؟ تۆ ئێستا لە دەمی گورگا ئیش بۆ من ئەکەی...... ١٠- تۆش خەمی منت نەبێ هەر هیچ، لەوە وریاترم تێبکەوم بەقوربان...... ١١- سوپاس خدر گیان چاوەکەمیت، نەک یەکێکیان بتبینن، با زوو داییخەینەوە......... ١٢- لە ئامانەتی خوادا بی.. هیچت پێویست نییە؟......... ١٣- هەر زۆر زۆر دەستخۆش........

(( .خواحافیزیی و داخستنەوەی مۆبایل و دڵخۆشیی نارەوەن))

Cut

---

دیمەنی – ١٨٣ – ڕ / د – شوێنێک لە قەزایەک:

(( خدر زەنگ ئەکا بۆ نارەوەن))

خدر (( دڵخۆش)): ١- نارەخان، نارەگوڵ، هەواڵ هەیە!،دەنگی چیم بێ......... ٢- کچێ تۆ هەر دڵپاکیت لێ ئەبارێ دادەخان......... ٣ - نارەخان گیان جا چیت بۆ بگێڕمەوە؟ ئێستا لەو دوکانە ئەگەڕێمەوە کە کاک ڕێشار بردمی و دوو دیاری گەورەی کڕی و خۆم خستمە سەیارەکەیەوە، ئەیبیا بۆ کچەکان.. بەخوا زۆر گەورەو زۆر گرانیش بوون، خەریک بوو نەتوانم هەڵیانگرم ..... ٤- وەڵاهی نازانم بۆ ئەوەیەتی یان نا! بەڵام وشکیشە لەگەڵیانا، یەعنی هیچ بەساقەو بەقوربانیشیان نابێ.. ئیتر نازانم، ئەمەی لەچی و ئەوەی لەچی؟........ ٥- ئەرەوەڵڵا بەلانی کەمەوە هەر یەکەی دوو سێ کیلۆ ئەبوون، وابزانم ماکیاژ بوون..... ٦- وەڵا ئیتر ئاوا بوو.......... ٧- نا نا بێخەمبە، مەگەر گڵ لێم ببیسێ، ئەرێ وەڵا ئەگەر ئەیزانن؟؟؟؟؟ ...... ٨- سوپاست ئەکەم خەمی منت نەبێ........ ٩- نا نا یەک زەڕە خەمت نەبێ، من ئەزانم چۆن خۆم ئەپارێزم، تۆ ئاگات لە خۆت بێ، با مناڵ و مێرد نەزانن........ ١٠- تا وریاتر بیت کەمە.. هەرکەس بەمەی نێوانمان بزانێ خراپە... گرنگ ئەوەیە تۆ هەرچییەکت بوێ بەدڵی خۆت دەستتی بخەم...... ١١- ڕاستە نەک یەکێکیان هەستم پێ بکەن.......... ١٢- قوربانی تۆبم، هەر خۆشیت نارەخان.. دڵخۆش بوویت بەو هەواڵە؟...... ١٣- دڵخۆشیی تۆم ئەوێ، سوپاس........

(( خواحافیزیی ))

Cut

دیمەنی – ١٨٤ – ڕ/ د – ماڵی زوبێر:

(( زوبێرو بروسک ، چا ئەخۆنەوە، چیمەن دوا پارچەی سفرەو پاشماوەی خواردن کۆئەکاتەوەو دێتەوە لایان بە چایەکەوە ))

زوبێر: ئیسراحەتێ بکە کچم زۆر ماندوو بووی!

چیمەن: گرنگ ئەوەیە بەدڵتان بوو، ئەوە ماندوێتیی بیرئەباتەوە.

زوبێر: خۆی ڕاستیەکەی ئەوەیە دڵخۆشین.. ئەزانی کێشەی ناوماڵ چی بەخواردنی زۆر نایاب ئەکا؟ وەک ئەوەی بەگەڵای زەیتونەوە خواردن دروست بکرێ، ئەو تاڵییەی لەدەم وەرئەدرێ، بەهیچ شیرینیی و خواردنێکی خۆش سەر زمان جێ ناهێڵێ، لەبەرئەوە وابکەن لە ماڵا بەردەوام دڵخۆش بن.

بروسک: بەڵام دەرەوە لێناگەڕێ.

زوبێر: سەدانجار ئەوەم تاقیکردۆتەوە، هیچ کاتێک کێشەکانی دەرەوە ناتوانێ شیرینیی ماڵ تێکبدا، کەچی تاڵیی ماڵ، شیرینیی دەرەوە ئەشێوێنێ.

چیمەن: دەمخۆش باوکی خۆم (( ئەچێتە لایەوە لە پشتەوە هەردوو دەستی لە ملی باوکی دەئاڵێنێ)) منیش ئەڵێم ماڵ سەرچاوەی ئاسوودەیی خەڵکە.

زوبێر: ماڵ نییە کێشەی نەبێت، ئەوە سروشتی مرۆڤە کاتێ دووانیان زۆر پێکەوە بن، پێک هەڵپڕژان و دەمەبۆڵەو پشت کردنە یەک هەر دروست ئەبێ.. بەڵام ئافەرین بۆ ئەو کەسەی لە بەشێک لە کبریائی خۆی خۆش ئەبێت و ئەویتر بە ئاگا ئەهێنێتەوە.

بروسک: سوپاس مامە.. بە ژیانم هەوڵ ئەدەم ئاوابم.

چیمەن: ئەی چۆن؟ باوکی من لە منالییەوە ئەوەی تیا چاندووم، کەچی دایکم نەیتوانی ئەو پێکەوە بوونە بپارێزێ... هههە ئێستاش کە ئەچمە لای وا ئەزانێ پیلانگێڕم و کەتنێکم بەدەستەوەیە.

زوبێر: پێمخۆش نییە لەسەر شتێک قسە بکەین، کە ڕابردوویەکی تاڵ بێت و چارەسەریش نەکرێ، ئەوە کات کوشتن و خۆماندوو کردنە.

بروسک: کەواتە لە ئێستاو داهاتوودا قسە بکەین.

زوبێر: بەڵێ بۆ نمونە، با زوو بچین بەدەم ڕێژوانەوەو سەری مزگەوت بدەین.. کاتێ ئەبینێ ئێمە بەدەم ئەو شتەوە ئەچین کە ئەو گرنگیی پێ ئەدا. ئەوە دڵی زۆر خۆش ئەکا.

(( چاکەی بەردەستیان ئەخۆنەوەو ئەچنە دەرەوە، چیمەن بەڕێیان ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٨٥ – ڕ/ د – سەیارەی کچەکان:

(( بێستان و تافان لە سەیارەکە دابەزیون، خەریکی هەر جۆرە شت کڕینێکن لە دوکان یان لەسەر عەرەبانەیەک.. ڕێشارو سەرەو مالە بەرەو لایان دێن، دەست لە شت کڕینەکە هەڵئەگرن و بە تەوازوعەوە ڕوویان تێ ئەکەن.. لە پشتەوە سەرەو مالە خدر بانگ ئەکەن و دوو کارتۆنی گەورەی لە سەیارەکەی ڕێشار پێ دائەگرن و نزیکی سندوقی سەیارەی کچەکان کارتۆنەکان دائەگرێ))

ڕێشار: ئەوە دیارییەکی بچووکە بۆ ئێوە.

بێستان: نا توخوا چ پێویستی بەوە ئەکرد کاکە ڕێشار گیان؟

تافان: دەستت خۆش بێ یاخوا، زۆر سوپاس.. هەر شتەکە جوان بێ باشترە.

ڕێشار: نازانم جوانە یا ناشرین، بە کابرای دوکاندارم وت باشترین جۆری موکیاجم بدەرێ، بۆ دیاریمە.. ئیتر هەر چۆنێک دەرچوو، ئەوە بۆ کابرا ئەگەڕێتەوە.

بێستان: هەرچییەک بێ کاکە ڕێشار مادام دیاریی جەنابتە هەموو دنیا ئەهێنێ. زۆر سوپاس، بەخوا پێویستی بەو عەزێتە نەئەکرد.

ڕێشار: نا نا شایانی لەوە زیاترن بێستان خان، ئەوە هەر هیچ نییە، ئێوە ماندوو بوون بە سەفەرەکەوە، کە گەڕاینەوە پاداشتێکی تایبەتیشتان هەیە.

بێستان: وای توخوا چۆن ئەبێ؟.. خۆ ئێمە هیچمان نەکردووە، نەبەخوا قبوڵی ناکەین.

ڕێشار: کە کاکتان بڕیارێکی دەرکرد قسەی تیا مەکەن، باش؟

تافان (( بە خەندەو نازەوە)): بەسەرچاو قسەی جەنابت گەڕانەوەی نییە..

بێستان: ئاخر وەڵاهی ئەوە ڕەوا نییە، تکایە با ئەوەی بۆ ئێمەی دائەنێن، هەست بەوە بکەین حەقی خۆمانە، نەک دیاریی و دەستودڵ باشیی تۆ.

ڕێشار (( لە کاتی ڕۆشتنا، خەندەیەک)): وتم قسەی من قسەی تیا ناکرێ. (( ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١٨٦ – ڕ/ ن – چێشتخانەیەکی شەعبی:

(( کرمانج خواردنێکی ئاسایی داواکردووەو لە تەواو بووندایە، محە ناشوکر دێتە تەنیشتییەوە ))

محە: هیچ پارووییەک بە تەنیا ناخورێ.. شەریکین.

کرمانج(( پارووی لە دەمایە)): ها محە چۆنی؟

محە: من باشم بەس برسیم بوو.

کرمانج: ناتوانی بە پارووی هەموو کەسێکا ڕابگەی.

محە: خەمت نەبێ، هەرکەسەو ملۆزمی خۆی بۆ پەیا ئەبێ.. دەعوەت ئاوایە؟

کرمانج: نەخێر فەرموو هەی ملۆزمە باشەکەم.

محە: نە باوە لێت تێکچووە، من ملۆزم نیم.. شەریکم شەریک.ههههە.

کرمانج (( بۆ شاگرد )): کاکە بزانە چی ئەخوا؟

محە: خواردنی من ئەناسنەوە، خۆیان ئەزانن.. تۆ پێم بڵێ کرمانج، بەو هەموو نەجابەتەوە کارت بە ڕێشار چییە؟ هەر نانە؟!!!!! (( بۆ جۆرێک درێژی ئەکاتەوە، وەک گومان کردن )).

کرمانج: هاتنی تۆ بۆ ئێرەو بینینی من چەند بەرنامەی هەبوو، چوونی منیش بۆ لای ئەو هەر ئەوەندە.

محە: دەی کەواتە ئاگاداری خۆتبە ڕۆڵە.. ڕێشار چەند بایەخ بە فڕێدانی ئەو چیلکەی دانە ئەدا دوای پاککردنەوەی دانی، هەر ئەوەندەش بەوکەسەی ئیشی پێی نامێنێ.

کرمانج: نا محە نا.. کاک ڕێشار پیاوێکی ژیرەو ئەزانێ کێ بەتەنگیەوە دێت و کێ بەرژەوەندیی خۆی لا گرنگە.. من ئەوەنەی لێ تێگەیشتووم.

(( نانەکەی محە دێت و بێ وەڵامدانەوە دەست ئەکا بە خواردن )) _____ Cut _____

دیمەنی – ١٨٧ – ڕ/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن وایت بۆردێکی داناوە، بە ماجیکی ئەلوان خەت ئەکێشێ، بە دەمییەوە گۆرانیی " ئەک ڕۆڵە سەردڵ خڕ بی، باب مردوو بی.. شەو درەنگە بۆ جێی ژوانێ" ئەڵێتەوە.. پاش کەمێک تیرۆژ دێت بۆ لای))

نارەوەن (( هێڵێکیتر ئەکێشێ و چەپڵەیەک لێ ئەدا)): دۆزیمەوە، ئەرەوەڵا، کچێ هیچ شتێک لەدەستی نارەگوڵ دەرناچێ. هههه .. ئەک ڕۆڵە سەردڵ خڕ بی، باب مردوو بی، شەو درەنگە بۆ جێژوانێ، ئەوا ڕۆژی ڕوناکە، هەموو عالەم دەیزانێ.

تیرۆژ (( وەک گاڵتە پێکردن)): نارەگوووووڵ؟!!!!!

نارەوەن: ئەرەوەڵا نارەگوڵ دەبتەقە دەی، ئێستا بە تەلەفون ئاوایان پێوتم، ئەوە هەر تۆو باوکە قرخنەکەتن بە ناشرینم ئەزانن.

تیرۆژ: دایکە ئەو وایت بۆردەم بۆ سەعی کردن داناوە، توخوا بەکاری مەهێنە.

نارەوەن: دەبڕۆۆۆۆ، من گەیشتمە ئەنجامی هەموو شتێک، ئیتر هەر نامەوێ، هەر بۆ خۆت.

تیرۆژ: ئەها.. بۆیە زۆر دڵت خۆشە.

نارەوەن: ئەیچۆن؟

تیرۆژ: باشە دە توخوا کە دڵت خۆش بوو گۆرانی مەڵێ، دەنگت زۆر ناخۆشە.

نارەوەن: هەی حەدت نەبێ، گوێبگرە.. لانک لانک لانکۆڵێ، لانک لە دارهەنارێ.. وەستا بێ لە تارانێ، لانکێ دروستکا بۆ چاو جوانێ هههههه

(( دوای دەستپێکردنی گۆرانییەکە، تیرۆژ هەردوو گوێی ئەگرێت و ڕائەکا))

Cut

دیمەنی – ١٨٨ – ڕ/ د – بەر مزگەوت:

(( زوبێرو بروسک و ڕێژوان، لە مزگەوت دێنە دەرەوەو لە دەرەوەی مزگەوت ئەوەستن))

زوبێر (( بۆ ڕێژوان)): کورم تۆ بچۆرەوە بۆ پرسەکە، ئەمرۆ هیچ ئیشم بە تۆ نییە.

ڕێژوان: باشە باوە گیان، زۆر سوپاس.. ئەگەر شتێکیش هەیە لە خزمەتدام.

زوبێر: نا کورم، تۆ بڕۆ.

(( ڕۆشتنی ڕێژوان و خواحافیزیی))

بروسک: ئەی من چی بکەم؟

زوبێر: تۆش ئەگەر ئیشت نییە بچۆ بۆ چایخانەکە، منیش ئەچمەوە بۆ کۆمپانیا.

بروسک: زۆر باشە، خۆم بڕۆم، یا لەگەڵتا بێم.

زوبێر: خۆت بڕۆ نزیکە.. منیش حەز ئەکەم کەمێک تەنیا بم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ١٨٩ – ڕ/ د – سیطرة:

(( پۆلیسێک لای سەیارەی کچەکان))

پۆلیس: لە کوێوە هاتوون؟

سەرە: باری کۆمپانیامان هەبوو، چووین بۆ جەردو وەرگرتنی، لەسەر مەرزەوە هاتووین.

پۆلیس: ناسنامەتان!!!

(( هەموو ناسنامەی خۆیانی ئەدەنێ و وەریئەگرنەوە))

پۆلیس: سنوقەکە چی تیایە؟

سەرە: تەنها دوو دەستە موکیاجی ئەو کچانەو هیچیتر، بینیان و حەزیان لێکرد.

پۆلیس: جا خۆ شار بڕوخێ بەسەر موکیاجا ئەڕوخێ، چۆنە لەوێ کڕیویانە؟ (( بۆ کچەکان)) هی ئێوەیە؟

تافان: بەڵێ هی ئێمەیە، بە ڕاستی زۆر تایبەت بوو، ئیتر کڕیمان.

پۆلیس: بە یارمەتی، ئەتوانین بیبینین؟

سەرە(( زۆر بەخێرایی)): وەی بەسەرچاو.

(( دائەبەزێت و بە پەلە سنوقی سەیارە ئەکاتەوەو نیشانی ئەدا.. دوو کارتۆنە مکیاژەکە بە نایلۆنی شفاف تغلیف کراوە))

پۆلیس: زەحمەت نییە هەڵیپچڕی و بیبینم؟

سەرە: نا قوربان گیان، بۆ زەحمەتە؟ (( بە قەڵەم بڕێکی بچووک کە لە گیرفانی دەری ئەهێنێ، نایلۆنی یەکێکیان هەڵئەپچڕێ)) ئەویتریش؟

پۆلیس: بەڵێ.

سەرە(( ئەویش هەڵئەپچڕێ)): فەرموو.

پۆلیس (( تەماشای قاتی سەرەوەی مکیاژەکە ئەکات و کەمێک لای ئەدا قاتی دووەمیش ئەبینێ و دایئەخاتەوە)): ببورن عەزیزێتمدان.

سەرە: نا قوربان گیان، ئێوەش ئەوە ئیشەکەتانە، دەستتان خۆش بێ.

(( ئەوان سەرئەکەونەوەو سەیارەکەی ڕێشار دوای ئەوان دێتە بەردەمی پۆلیسەکە))

Cut

دیمەنی – ١٩٠ – ڕ / ن - چایخانەکە:

(( هاوڕێی لێیەو ئەردەڵان و چەند کەسێکیش دانیشتوون، بروسک بە پانتۆڵ و کراس و چاکەت و بەبێ بۆینابخ دێتە ژوورەوەو سڵاو ئەکاو وەڵامدانەوە. بروسک ئەیەوێ جەو تلطیف بکا.. خەندەی زۆر ئەکەوێتە دیمەنەکەوە))

هاوڕێ: ئەمرکە برا.

بروسک: خوا براکەت سەلامەتکا، چایەکی خەستی یەک لوولە.

هاوڕێ: هیچ ئاوی تیا نەبێ؟ یەکسەریی؟

بروسک: بەڵێ یەکسەریی برا.. کە ئاوی تیابێ تامەکەی ئەگۆڕێ..

هاوڕێ: دەی دیارە چاخۆری باشیت؟!

بروسک: ئۆو جارێ سەرەتای ڕێگەیە، ماوەیەکیتر وەڕس ئەبی بەدەستمەوە، داواشی بکەم نامدەیتێ هههها ئەوە بەزمی منە لەگەڵ هەموو چایچییەکانا.

هاوڕێ: چۆن شتی وا ئەکەم کاکە؟ ئەوسا تۆش نایەیتەوەو ئەهـ ، جا ئەم خەسارە بۆ لە خۆم بدەم؟

بروسک: هههە نا نا ئیشەکەم لێرەیەو هەر چاکەت خۆش بێ دڵنیابە بە هیچ لایەکا ناچم.

هاوڕێ: بۆ لە کوێ ئیش ئەکەی؟

بروسک: لە کۆمپانیاکەی کاک زوبێر.

هاوڕێ: ئۆو یاخوا بەخێر بێی، دیارە تازە دامەزراوی؟

بروسک: هێشتا هەڵاوم لێ هەڵئەسێ ئەوەندە تازەم... (( قومێک لە چاکەی ئەدا)) واو چاکەت زۆر خۆشە.

هاوڕێ: دەی عافێتت بێ.. (( دێتە لایەوە)) بەس من ئەبێ هەموو شتێکت لەبارەوە بزانم وەک ئەوەی کارتی نیشتیمانیت بۆ دەربکەم هههها.

بروسک: جارێ زووە براڵە، ئەرێ خۆ من هەر ناویشت نازانم، چۆن هەموو شتێکت لەسەر خۆم پێ بڵێم.

هاوڕێ: ئەها ئەگەر وا نەبێت ئەوا ناوت تەسجیل ناکرێ و نابیتە مشتەریی من و چات بە زەحمەت دەست ئەکەوێ.. من ناوم هاوڕێیە.

بروسک: ناودێر بی ئیشەڵڵا.. دیارە سیستمی ئێرە جیاوازە؟!

هاوڕێ، ئیتر ئێرە ئاوایە.. یەکەم.. ناوت چییەو ئیشت چییە لە کۆمپانیاکەو سەڵتی یان خێزاندارو (( بروسک بە سوعبەتەوە واقی وڕ ماوە )) برادەرت هەیە لێرە یان نا و چیت خوێندووەو ماڵت لە کوێیە؟

بروسک: تۆ پرسیاری دووەمم پێ بڵێ، با وەڵامت بدەمەوە، پرسیاری یەکەمت ئەخەینە سبەینێ هههها. (( پێکەنینی هەمووان))

Cut

دیمەنی – ١٩١ – ڕ- عەسرێکی درەنگ/ د – بەردەرگای ماڵێک:

(( سەلوا زۆر بێتاقەتە. نیوەی گیانی لە دەرگایەک هێناوەتە دەرەوەو ڕێژوانیش بێتاقەت لە بەردەمی وەستاوە، ژاوەژاو و غەڵبە غەڵب هەیە.. بەردەرگای خانووی تەعزێی ژنانە.. ئەکرێ باڵاو کلێپەش بەوێدا بڕۆن.. ئەگەر دەرکەوتنێک هەبێ، تەنها ژنانە. ))

سەلوا: تۆ بەیانییەکەی حەیوانێکت ناردووە، ئەم هەموو مریشکەت بۆ هێنا؟ بە خوا بەشی بەیانیشی ئەکرد.

ڕێژوان: تا زۆر بێ باشترە بەساقە.. هیچیتر پێویست نییە؟

سەلوا: جا تۆ ئەهێڵی هیچ پێویست بێ؟.. دەستت خۆش بێ ماڵتان ئاوا بێ.

ڕێژوان: عەیبە ئەو قسانە مەکە.. (( وەک بیری بکەوێتەوە)) ئا ئەوە باوکم و ئەوان بۆ مزگەوتیش هاتن، وا ئێستاش هاتنەوە بۆ خێمەکە، ئەبێ بچمەوە بۆ ئەوێ.. هەرچی پێویست بوو زەنگم بۆ بکە. باش؟

سەلوا: بەساقەوبم زۆر سوپاس.

(( ڕێژوان ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١٩٢ – ڕ/ عەسر – بەردەرگای قاوەخانەکە:

(( ڕۆستەم و سالم لە شوێنێکی بەردەمی قاوەخانەکەدا وەستاون و لە میوتیدا قسە ئەکەن، تریفە دێتە دەرەوەو دیقەتیان ئەدا .. پاش کەمێک بەرەو قاوەخانەکە ئەچن،

# (( ئەڵقەی دە ))

کە ئەگەنە ئاستی تریفەو سڵاو و وەڵام))

تریفە: ئەڵێی لەم دەوروبەرە مقاوەلاتێکتان گرتووە؟ هەموو ئەمڕۆ یا لە ژوورەوە یان لە دەرەوە بوون؟!

سالم: نا مقاوەلات نییە، پرۆژەیەکی خەیرییە.

ڕۆستەم: ڕاستییەکەی چاوەڕوانی کەسێک ئەکەین، ئەڵێین بەڵکو دەرکەوێ، جا کە پیاو جەنابیشت ئەبینێ بەو هەموو جوانییەوە، حەز ئەکا ئەمناوە چۆڵ نەکاو هەر لێرە چاوەڕێی بکا.

تریفە(( نازێک)): دیارە جوانت نەبینیوە، من کوا جوانم؟ سەردەمی جوانیم تێپەڕی، ئەی جاران بتبینیمایە ئەتوت چی؟

ڕۆستەم: نازانم چیم ئەوت، من بە ئێستات ڕازیم، هەقم چییە بە جارانتەوە؟

تریفە (( نازی زۆر)): ئۆو زۆر سوپاس ئازیزیت.

سالم(( بە ئانیشک لە ڕۆستەم ئەژەنێ و ئامازەی ژوورەوەی بۆ ئەکا)): سوپاس بۆ جەنابیشت خوشکەکەم، با ئێمە بچین شتێ بخۆین.

تریفە: فەرموون، فەرموون!

(( ڕۆستەم و سالم ئەچنە ژوورەوە، تریفەش ئەگەڕێتەوە شوێنی خۆی))

Cut

دیمەنی – ١٩٣ – ڕ/ د – بەردەمی زانکۆ:

(( تایەر بە سەیارەوە ئەگاتە بەردەمی زانکۆ.. کەس نابینێ))

تایەر (( لەبەر خۆیەوە)): ئەی هاوار، خۆ ئەڵێی دیسان عوتڵەیانە، ئەرێ خۆ کەس دیار نییە، بەخوا بەخوا هەر ئەو خەوەم بینی ئەمشەو، زانیم نایبینم... ئاخر دە توخوا عوتڵە بوو بەچی؟ دەی من چی بکەم ئەمڕۆ؟ سا وەڵڵا ئەچم لای ماڵەکەیانەوە، وەک نەمام ئەچەقم تا ئەیبینم.. ئەی هاوار خۆ شێت و هار ئەبم نەیبینم.

(( ئەگەڕێتەوەو ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٩٤ – ڕ/ دەمەو عەسر / د – دەروازەی شار، یان ڕێگەی گشتیی:

(( هەر سێ سەیارەکەی سەفەری سەر مەرز ئەوەستن، ڕێشار لە سەیارەکەی دائەبەزێت.. دێتە لای سەیارەی کچەکانەوە.. دوای ماندوو نەبوونیی کردن و سڵاو))

ڕێشار: بە درێژایی ئەو ڕێگەیە من بیرم لای ئەو دیارییانەی ئێوە بوو.

تافان: وەیش توخوا، بۆ کاک ڕێشار ؟

ڕێشار: جا خۆ دڵنیا نەبم زۆر باشە، ئەمشەو خەوم لێ ناکەوێ، دواجار وتم ئەرێ وا گەیشتینەوە دەروازەی شارو من دڵنیا نەبوومەوە، با خۆم سەیرێکی بکەم و ئەوسا ئیتر بێ خەم ئەبم.

بێستان: توخوا تۆ زۆر عەزێت ئەکێشی لەگەڵ ئێمە، خەجاڵەتت کردین.

ڕێشار(( بەرەو سندوقی سەیارەکە ئەچێت و بە هاکەزایی تەماشایەکیان ئەکات)): سەرە بە کەڵک نایەن بیخەرە سەیارەکەی خۆمەوە... (( دێتەوە بۆ لای کچەکان)) باش نەبوو تەماشام کردن؟

بێستان: بۆ؟ چی بوو؟

ڕێشار: کەڵکی یەک دیناری قەڵبیان نەبوو، ئەوە بەسەرەم وت فڕێیان بدات، بەس لەم سەر جادە گشتییە نا.

تافان: واییی توخوا بۆ؟ ئەی بۆ بۆی نابەیتەوە؟

ڕێشار: ئەو کابرایە قۆڵبڕ دیارە، شەرتبێ بچمەوە سەری هەمووشی بدەمەوە بەسەریاو چینێکی باشیشی بکوتم، کەس وای لێنەهاتووە بتوانێ فێڵ لە ڕێشار بکا (( دەست ئەکا بە بەرباخەڵیا هەر یەکەیان و ٢٠٠ دۆلاریان بۆ ئامادە ئەکا)) ها خوشکەکانم ئەمە لە بری دیارییەکە، خۆتان بچن شتێکی جوانی لێ بکڕن.

(( لەناو قسەی ئەبێ و نابێ ی ڕێشارو بێستاندا، تافان ئەوی خۆی وەرئەگرێ و ڕێشاریش ئەوی بێستان فڕی ئەداتە ناو سەیارەکەو دەرگا دائەخاو ئەکەونە ڕێ))

Cut

دیمەنی – ١٩٥ – ڕ/ن – دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( ئامۆ حسابات ئەکات و ئاودێر بۆی ئەخوێنێتەوە ))

ئاوا: ١٢٥ براکێتی دیوار، ئەگەر بە ٣٠ دۆلار بۆیان دابنێین، ٣٧٥٠ دۆلار.

ئامۆ : زۆر نییە؟

ئاوا: بیکە بە ٢٨ باشە؟

ئامۆ: بەخوا هەر زۆرە، ٢٥ باشە. ئەوان وتیان مامناوەند بێ.

ئاوا: نا ٢٥ زۆر کەمە.. ٢٧ باشە، ٣٣٧٥ ئەکا.

ئامۆ (( ئەینوسێ )): ئەی لیدەکان؟

ئاوا (( بۆی ئەگەڕێ )): ئا لیدەکان ٢٥٠ دانە، بە ٧ بۆیان دابنێ، ١٧٥٠ دۆلار.

ئامۆ(( ئەینوسێ، دواتر)): جا خۆ باوکم نەبووایە، بە سورەیا گەورەکان تیاچووبووین، نەگبەتی وەک ئەحە لە کوێی بوو ئەو هەموو پارەیەمان بداتەوە؟

ئاوا: ئەوە تەواو، خوا بکا زەرەری ترمان لێ نەکەوێ.. تۆ کێبڵ بنوسە..

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ١٩٦ – ڕ/ د – نزیکی ماڵی دارەوان:

(( تایەر دێت و نزیک ئەبێتەوە لە ماڵی دارەوان و ئەوەستێ))

تایەر (( لەبەرخۆیەوە)): خوایە گیان بیبینم، خوای گەورە بیخەیتە دڵیەوە، بۆ خۆڵڕشتنێ، شت کڕینێ، بۆ هەر شتێک بێتە دەرەوەو بیبینم.. جا خۆ ئەمشەو سوێم ئەبێتەوە نەیبینم.. (( کەمێک بێدەنگێ)) کورە خۆ ناوی خۆیشیم پێ ناڵێ، سەیرە چەند بەم گەڕەکەشا دێم و ئەچم، یەکێکیان ناناسم، هەرکەسێکیش سڵاوی لێ ئەکەم بۆ ئەوەی ببێتە برادەرم، هەموو لالوتن.. ئای خوایە خەڵکی چۆنیشت دروست کردووە.

(( دێت و لای ماڵی دارەوان زۆر خاوی ئەکاتەوەو سەرەتاتکێ ئەکات.. گێلاس دێتە دەرەوەو سەیری ئەکا، تایەر ئاگای لە خۆی نییە، گێلاس بانگی ئەکا))

گێلاس: کاکە، کاکە.

تایەر (( سەیری ئەکا)): بەڵێ!

گێلاس: ئەوە بۆ کێ ئەگەڕێی؟ بۆ وا سەیری ماڵی کاک دارەوان ئەکەی؟

تایەر (( شڵەژان)): ئەمە ماڵی کاک سابیر نییە؟

گێلاس: نا براکەم، ماڵی کاک سابیر نییە.

(( تایەر سوپاسی ئەکات و بە خێرایی ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١٩٧ – ڕ- دەمەو ئێوارەی درەنگ- شوێنێک:

(( خدر تەلەفون ئەکا ))

خدر: بەڵێ هەردوو پاکەتە مکیاژەکەی خستە سەیارەکەی خۆیەوە....... نازانم، بە حساب بە کەڵک نەهاتن...... هەر ئەوەم بینی، ئیتر پارەی داونەتێ یان نا؟ ئەوە ئاگادار نیم، ئێمە دانەبەزیین......... بەسەرچاو، وا ئەکەم.. فەرمانتە...... خواحافیز.

(( خدر مۆبایلەکەی هەڵئەگرێتەوەو ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ١٩٨ – ش/ن – ماڵی دارەوان/هۆڵ:

(( تیرۆژ خەریکی سەعی کردنەو بە مۆبایلەکەی گۆرانییەک لێ ئەدات.. دایکی دێتە هۆڵەکە))

نارەوەن: کچێ بەخوا مازوو چنین و بە دارا هەڵڕوانینیان نەوتووە.

تیرۆژ (( کەم حەوسەڵە)): دیسااااان .. (( مۆبایلەکە ئەکوژێنێتەوە)) ئەوە کوژاندمەوە باشە؟!

نارەوەن (( جەوی هەیە، بە ڕابواردنەوە)): لەبەر شەحنەکەی ئەڵێم ڕۆڵە، نەک خێرەومەندێ تەلەفونت بۆ بکا؟!

تیرۆژ: وەڵا من خێرەومەندم نییە دایە گیان، خۆ وەک تۆ نیم بەردەوام بە شحنەوە بێت و بەشیشم نەکا.

نارەوەن(( بە گاڵتە)): ئاخر ئەوەی من پاترییەکەی تەواو نییە ڕۆڵە.. ئەی چۆن؟ هەهە

تیرۆژ: باشە بهێڵە سەعیەکەم بکەم، با نەچمە ژوورەکەی خۆم.

نارەوەن: نەء ژووری خۆت نەء، لەبەرچاوی خۆم دەرس و دەورەکەت ئەخوێنێ.

(( تیرۆژ وەڵام ناداتەوەو خەریکی سەعی ئەبێ، نارەوەنیش سەرقاڵی مۆبایل))

Cut

دیمەنی – ۱۹۹ - ش – ن – پرسەی باوکی هەندرێن، لە شەودا - خێمە:

Mute

(( هەندرێن لای خوارەوە بە پێوەیە.. زوبێرو دارەوان و بروسک و ڕێشارو کرمانج و سەرەو مالەو حەمە خدرو هاوڕێی چایچی و ئەردەڵان و ئامۆ هەموو دێن بۆ پرسەکە، ئەکرێ هەر جارەو یەک دوویەکیان بێن، بە پێی نزیکییان لە یەکەوە، ڕێژوان بەردەست هەڵئەسوڕێ یان لای هەندرێنەوە وەستاوەو جاروبار ئیشێک ئەکا.. گەر لوا لە خێمەدا بێ جوانترە، هەندێ کۆمبارسی تریش هەبن.. ئسوڵی پرسە بەڕێوە بچێ))

Cut

دیمەنی – ٢٠٠ – ش/ن – بلیاردەکە:

Mute

(( ئاوا لە بلیاردەکە یاری ئەکات لەگەڵ کەسێکدا.. نیسکافە ئەخواتەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٠١ – ش/ د – قاوەخانەی تریفە:

(( ڕۆستەم و سالم لە دەرەوەی قاوەخانەکەن))

سالم: تۆ بچۆ ژوورەوە، دیقەتێک بدە، بزانم کەسێک هەیە چاودێریت بکا؟

ڕۆستەم: کورە کەسی چی، بیللاهی لە سوژن بێکەسترە.. کێ لەو باوەڕەدایە کچێکی ئاوا نازدار بکوژرێ؟ باوکیشی بیری لە شتی وا نەکردۆتەوە، وەڵا حەز ئەکەی ئێستا ئەچم فیشەکێک ئەنێم بەسەریەوەو هەر زۆر بە ئیسراحەتیش ئەڕۆین هههە.

سالم: نازانم خدر ئەڵی، ئەوەندە خۆتان نیشانی ئەو خەڵکەی ئەوێ مەدەن، با بە دەموچاوتان ئاشنا نەبن.. وابزانم ئەمشەو دوا شەوی چاودێری کردنیەتی، سبەی ئەیکوژین و باقیی پارەکە وەرئەگرین.

ڕۆستەم: بەڵێ سبەی لە دەست عەزابی دنیا ڕزگاری ئەکەین، کورە ژیان چ خۆشییەکی تیایە بۆ قوڕبەسەرێکی وا. هههەه.

سالم: یەعنی بڵێ چاکەی لەگەڵ ئەکەی؟! هههە

ڕۆستەم: بەخوا سالم هەرچەند ئەکەم دەستم تێی ناچێ، من لە دەرەوە چاودێریی ئەکەم و خۆت نەجاتی بدە.

سالم: باشە خەمت نەبێ، ئەزانم چاوت بەرایی نادا بە مردوویی بیبینی.

ڕۆستەم: ناوەڵا هەرگیز.________________ Cut ________________

دیمەنی – ٢٠٢ – ش/د – خێمەی تەعزێکەی باوکی هەندرێن:

(( هەندرێن و ڕێژوان و چەند گەنجێک لەو دەوروبەرەن))

ڕێژوان: نا کاکە هەندرێن ئەرکی چی؟ بە ڕاستی من کە باوکم ڕایسپاردم ئاگام لێی بێ، زۆر بە دیارییەوە ئەمامەوەو خەفەتی زۆرم بۆ ئەخوارد.. بە ڕاستی داخەکەی گران بوو.

هەندرێن: وەڵا شتێکت کرد مەگەر هەر بە برای دایک و باوکیم بکرایە.. من لێرە نەبووم، بەڵام تۆ مەردانە ئەو چاکەیەت کرد، کە ئەوەندە گەورەیە نزانم بەچی قەرەبووت بکەمەوە؟

ڕێژوان: نا توخوا ئەگەر وا بڵێی کاکە هەندرێن، ئەی ئێمە لە تەنگانەیا بەهانای یەکترەوە نەچین، ئیتر برایەتیی و دۆستایەتی مانای چییە؟ تکا ئەکەم هەر بیریشی لێ نەکەیتەوە.. خۆزگە ئەو بمایەو من دە ڕۆژ لەسەر یەک قاچ بوەستامایە.

هەندرێن: قوربانی تۆ بم، بە ڕاستی سەلمانت کوڕی تەنگانەیت.

Cut

دیمەنی – ٢٠٣ – ش/ د – بەردەمی کۆمپانیای ڕێشار:

(( خدر وەستاوەو سەرەو مالە لەسەر شەقامەکەوە دەرئەکەون و دێن ))

سەرە: ئافەرین خدر گیان ماویتەوە.

خدر: کاک ڕێشار پێیێ وتم نەڕۆی تا تۆو کاکە مالە دێنەوە، نەک ئیشی پێم بێ.

مالە: دەباشە بوەستە ڕاست ئەکا.. وەرە سەرە، بەرەو کۆڵانەکە ئەچن.

(( خدر تەنیا ئەوەستێ))

Cut

دیمەنی – ٢٠٤ – ڕ / ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار هەردوو کارتۆنی ماکیاژی کچەکانی لەبەردەستە، ژێرەوەی هەڵئەداتەوە.. کۆمەڵە کیسەیەکی تلیاکی تیایە، جوان کەبس کراوە.. دەری ئەکات و ئەیخاتە کارتۆنێکی ئاوەوەو سەفتەیان ئەکاو بە تیپ ئەیپێچێتەوە.. چەند جامە ئاوێکی کارتۆنەکەش ئەخاتە سەریان.. زۆرێک لە ئاوەکانیش لەسەر مێزەکەن.. لەوکاتەدا کرمانج دێتە ژوورەوە))

کرمانج: ئەو ماکیاژانە چین گەورەم؟

ڕێشار: ئەوە ئەمڕۆ بۆ کچەکانم کرد بە دیاری، بەڵام بە کەڵک نەهاتن، سەیرم کردنەوە بزانم خێرێکیان تیایە یان نا؟ هیچیان تیا بەسەر نییە، حمەخدر بانگکە فڕێیانداو ئەو ئاوانەشم بۆ بخاتە سەلاجەکەوە.

کرمانج: جا خۆم ئەیکەم گەورەم، حمەخدری بۆچییە؟

ڕێشار: بچۆ یەکێکیان بانگکە، ئەوە ئیشی من و تۆ نییە کرمانج.

کرمانج: بەسەرچاو (( ئەچێتە دەرەوە))

(( ڕێشار بە پەلە کارتۆنەکەی کە پڕی کردەوە ئەباتە تەنیشت سەلاجەکەوە، ٣ کارتۆنیتر ئاو لەو ناوەیە، یەکێکیان ئەخاتە سەری، دێتەوە لە جێگەکەی خۆی دائەنیشێت، کرمانج و خدر دێنە ژوورەوە، کرمانج دیقەتی دوو کارتۆنە ئاوەکە ئەدا کە خراونەتە سەر یەک لە تەنیشتی سەلاجەکەوە))

ڕێشار: وەرە کورە، ئەو موکیاجانە فڕێدەو ئەو ئاوانەشم بۆ ڕێکخە، ئەم فەلانە بخەرە سەلاجەکەوە.

خدر (( دەست پێ ئەکا)): بەسەرچاو گەورەم.

کرمانج (( دیقەتی ئاوەکان ئەدا)): ئەی کارتۆنی ئەوان کوا گەورەم؟ با فڕێیدا.

ڕێشار (( کەمێک شڵەژان)): نا ئەوە لەو کارتۆنانەیتر دەرم کردووە. دەی دەستوبردکە کورە.

خدر: هەر ئێستا گەورەم، وا تەواو.

(( خدر خەریکی خستنە ناو سەلاجەی ئاوەکان ئەبێت و ڕێشار ڕێنمایی ئەکا))

خدر: تەواو گەورەم؟ ئەمرێکیترت نەبوو؟

ڕێشار: ئەو موکیاجانەش فڕێدەو بڕۆ ملت بشکێنە.

خدر: دەست ماچ ئەکەم گەورەم، بەسەرچاو.

(( خدر کارتۆنی ماکیاژو ماکیاژەکان کۆ ئەکاتەوەو ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٠٥ – ڕ/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن تەلەفون ئەکا ))

نارەوەن: نا، کەس لە ماڵەوە نییە، هەر خۆمم.......... کورە دە گوێ مەدە بە قسەو قسەڵۆک خۆت وەرە.......... دەی باشە، ئاخر تا خۆم ئەگۆڕم و سەرێ بە ملا ئەشۆم، ئەی خۆ بەو چڵکنیی و پڵکنییە نایەمە دەرەوە؟...... بەخوا بۆیە ئەڵێم هەر خۆت بێی باشترە................ دە باشە بە قسەت ئەکەم، دیارە زۆر گرنگە، باش دەی هەر نیوسەعاتێکیتر لەوێم............... ئەی لە کوێ؟ .................. ئۆو دیارە زۆر نهێنییە ........ باشە بەقوربان، دێمە بەر ئەو سوپەرمارکێتەی پێت وتووم........... دەی ئاگات لە خۆت بێ...... خواحافیز. (( مۆبایل دائەخاتەوەو لە شوێنێک دایئەنێت ))

نارەوەن: ئەبێ چی بێ وا خدرە شێت زۆر موهیمی کردووە هەهە ئای لە خدر؟!!!

(( ئەچێتە دەرەوەی هۆڵەکە ))

Cut

دیمەنی – ٢٠٦ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆ دانیشتووەو ڕاهۆز بەپێوە ))

ڕاهۆز: گەورەم پێویست ئەکا ڕاستەوخۆ بیانگرین؟

سەرکۆ: نا، ئەوەی پێموتی هەر ئەوە بکەن.. ئەوان بگیرێن، هەموو شتێک ئەوەستێ و ناگەینە هیچ ئەنجامێکیش، ئەوە وەک زەنگێک وایە بۆ هەموویان، کە ئێمە ئاگاداری هەموو شتێکیان هەین.. پەلەمان نییە، وردە وردە هەموویان بەمجۆرە خۆیان بۆ ناگیرێ و ئاشکرا ئەبن، ناکرێ بۆ دەسکەوتێک، باندەکەمان لێ ون ببێ.

ڕاهۆز: زۆر ڕاستە گەورەم، خۆ باندەکەش هەر ئەدۆزینەوە، بە پاشاکەشیان هەر ئەگەین، ئەوان لەدەست ئێمە قوتاریان نابێ.

سەرکۆ: بەڵام کاتی زیاترمان ئەوێ وئەوانیش تاکتیکی کارکردنیان ئەگۆڕن.. با هەر ئاوا ئیش بکەن، باوەڕ ناکەم زۆریان مابێ.. گرنگ ئەوەیە نەهێڵن هیچ جۆرە شپرزەییەک ڕووبدا.

ڕاهۆز: سەرچاوم گەورەم فەرمانتە.. ئەچم خەریکی ئامادەکاریی ئەبم.

سەرکۆ: فەرمووو.

(( تحیةو ڕۆشتنی ڕاهۆز))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٢٠٧ – ڕ/ن – ماڵی خدر:

(( خدر لە دەرگای ژوورەکەیەوە فەرمووی نارەوەن ئەکا بێتە ژوورەوە ))

خدر: فەرموو فەرموو نارەخان!

نارەوەن (( دێتە ژوورەوە، چاو بە ژوورەکەدا ئەگێڕێ کە هیچی تیانییە، جگە لە دەستە نوێنێکی خدرو تەرمۆزەیەکی ئاو و زۆپایەکی هەڵکراو)) : ماڵی زوگورتیی چەند کەساسانەیە؟!

خدر: داوای لێبوردن ئەکەم، کورسیەکیش نییە لەسەری دانیشی، بە ژیانم چاوەڕوانی ئەم شانازییەم نەکردووە تۆ پێ بخەیتە ماڵم، ئەگینا حسابم بۆ ئەکرد.. بۆ لەمەودوامان، کە هاتی ئەم ژوورە بە جۆرێکیتر ئەبینیتەوە، وابێ بۆ خۆت ئامادەکرابێ.

نارەوەن: نەبابە نا، شتی وا مەکە (( لە سەر جێگاکەی ئەو دائەنیشێت )) ئەمە عەیبی چییە؟ خۆ لەسەر کورسی لەدایک نەبووین؟ هههە. شتی وا نەکەی.. ئەگەر من بە هاوڕێیەتی تۆ ڕازی بم بە هەموو شتێکت ڕازیم.

خدر: لەگەڵ دەستکورتیی هیچ ناوترێ، بە ڕاستی تەنها بۆ خەویش ئیشم بە ماڵ هەیە، ئەگینا من لە سبای ساڵحانەوە لەدەرەوەم تا نیوەی شەو.

نارەوەن: تۆ شتەکەم پێ نیشان بدە چییە؟ ئەو قسانەم بۆ مەکە، بە پێچەوانەوە زۆر خۆشەو چێژی خۆی هەیە، کوا شتە گرنگەکە؟

خدر (( هەر بە پێوەیە)): یەک دەقە، لەو ژوورەیترە ئێستا ئەیهێنم. (( ئەچێتە دەرەوە ))

نارەوەن (( تا ئەو دێتەوە، سەیری نوێنەکانی ئەکات و بۆنیان ئەکا، وەک ئەوەی بۆنی ناخۆش بێت، دایئەنێتەوە، خدر دێتەوە)): ئەوە چییە ئەو هەموو شتە، بۆ منت نەکڕیبێ برادەر؟

خدر: تۆ سەیریکە جارێ!! (( ماکیاژەکان دائەنێ، ئەوەی ڕێشار پێی وتبوو فرێیدات ))

نارەوەن: ئەوە چییە خدر ئەو هەموو ماکیاژە؟ پارەت پێدابێ بۆ من ئەتکوژم.

خدر: تۆ پێم بڵێ جۆرەکەی چۆنە؟

نارەوەن: ئەمانە گرانبەهان، جۆرێکی زۆر باشە.. لەکوێت بوو؟

خدر: ئەمە ئەو موکیاجەیە کە ڕێشار بۆ کچەکانی کڕی و دواتر لێیوەرگرتنەوەو بە منی وت فڕێیدەم.

نارەوەن (( زۆر ئەمدیوەو دیویان ئەکات و دیقەتیان ئەداتێ)): واو ئەمە نەک هی فڕێدان نییە، کەم کەس دەستی ئەکەوێ.. سەیرە فڕێدان بۆ؟

خدر: نازانم، تا ئێستا چەند سەر دێنم و سەر ئەبەم، لە هیچ تێناگەم.

نارەوەن: هەروەها منیش.. ئەبێ نهێنیی ئەمە بدۆزینەوە، ئەوسا لەوە تێ ئەگەین ئەم دوو کچەی بۆچییە... تۆ بڵێی مەرامێکی پێیان نەبووبێ و دوای ئەوەی ئەوان ڕەتیان کردبێتەوە، دیارییەکەی لێوەرنەگرتبێتنەوە؟

خدر: نا.. ئەوە نییە، چونکە هەریەکەو لە سەیارەیەکا بوون و هەر لە ڕێگەش لێیوەرگرتنەوە، بەڵام بۆ خرایە سەیارەی ڕێشارەوەو چی ئەکا لە کۆمپانیا؟ لە کۆمپانیاش بە هەڵوەشاویی لەسەر مێزەکەی بوو.

نارەوەن: ئەمە ئەقڵمان تێک ئەدا خدر.. زۆر سەیرە.

خدر: خەمت نەبێ، ئەی خدرت بۆچییە؟

نارەوەن: وەڵا ئەبێ زۆر ورد چاودێرییان بکەی، ئەگینا ئەم لوغزە نامانگەیەنێت بە هیچ شتێک.

خدر: دڵنیابە زیاتر لە توانای خۆم چاودێرییان ئەکەم، ئەم ئێوارەیە نەبێ، کەمێک ئیشی ماڵی پورم هەیە، داماوە ئەشیای هەیە بۆی بگوێزمەوە، ئەگینا ئەوێ بە لەحزە جێناهێڵم.

نارەوەن: زۆر باشە، نەتگەیەنم بۆ ماڵی پورت؟

خدر: نا نارە گیان، خۆم ئەچم.. بەس توخوا هیچ تەلەفونم بۆ مەکە، چونکە مۆبایلەکەم دائەخەم، ئەو پوورەم بە دەنگی زەنگی مۆبایلی من، کەللەیی ئەبێ.

نارەوەن: نا نا هیچ خەمت نەبێ، تۆ هەرچییەکت دەسکەوت زەنگم بۆ بکە، من نایکەم.

خدر: هەر ئەمڕۆ.. چونکە ڕەنگە من کاتێ زەنگ بکەم بۆ نمونە کاک دارەوان لە ماڵ بێ، ئەزانی ئەبین بە چ فلیمێک؟

نارەوەن: خەمت نەبێ تا نیوەشەو نایەتەوە، قەت مۆبایلیشم نابینێ، تۆش هەر بەڕۆژ تێل بکە، چونکە شەوان کچەکەی لێیە، نەک ئەوە سوتفەیە بۆی بگێڕێتەوە، ئەوکاتە ناڵێ تۆو خدر چیتان هەیە بە یەکەوە؟ ڕەنگە دڵی بۆ شوێنی خراپ بچێ... (( ئیستێک)) دەی با ئیتر من بڕۆم.

خدر: دە توخوا دانیشە با نانی نیوەڕۆ بێنم و پێکەوە بیخۆین، خۆ لە دەرەوە ناکرێ من بەم جلانەوە دانیشم لەگەڵتا دەعوەتێکت بکەم؟!

نارەوەن (( پێکەنین)): بۆ ئەمە جلی شین و شاییتە؟ هههههه

خدر: با جارێ وابێ تا کەمێک خۆم ئەگرم.

نارەوەن(( ئەیەوێ هەستێتە سەرپێ ناتوانێ.. خدر دەستی ئەگرێ بۆ هەستان)): دەی خوا نەیبڕێ.

(( خواحافیزیی و سوپاس و داوای لێبوردنی خدر بۆ ماڵەکەی))

خدر: موکیاجەکان بۆ تۆیە.. نەتبرد!

نارەوەن: نا خدر گیان، ئەی پێم ناڵێن ئەم هەمووەت لە کوێ بوو و بۆچیتە؟

خدر: دەی باشە هەر لای خۆم بۆت هەڵئەگرم.

نارەوەن: سوپاس.

(( خواحافیزیی)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٢٠٨ – ڕ- عەسر/ ن – چایخانەکە:

(( بروسک ئەچێتە چایخانەکەو داوای چا ئەکات و لە کاتی چا خواردنەوەکەی بە سەرسامیی دیقەتی محە ناشوکر ئەدا، کە کراسە پەڵەدارەکەو شەرواڵە بە جگەرە کون بووەکەی مالەو سەرەی لەبەردایە.. هەڵئەسێت و بە هێمنیی ئەچێتە لایەوە، محە سندوقی شت فرۆشتنەکەی خۆی لە بەردەمدایە))

بروسک: ئەوە ئەم شتانە ئەفرۆشی خاڵە؟

هاوڕێ: مەڵێ خاڵە، ئەوە محەیە محە، محە ناشوکر.

بروسک: وایە کاکە محە؟

محە: کاکەشی ناوێ گەنجی قۆز، هەر محە بە ڕووتیی، بە بێ جلوبەرگ.. ئەی بۆچی لێرە دانیشتووم؟ هەهە.

بروسک: وەڵا جلەکانیشت جوانن هەهە ئیتر بۆ بەڕووتی؟ بەڕاست لە کوێ کڕیت؟

محە: بەخوا دیارە فڕ نامناسی.. ڕۆڵە کڕینی چی؟ ئەگەر تۆش پارچەیەکت لێ زیاد بوو، ئەتوانم تا دڕینی بۆت لەبەر بکەم، بەس پانتۆڵ نا هەهەهە

بروسک: دەی من شەرواڵم نییە.. ئەو خێرەومەندەی ئەم جلانەی داویتێ، با ئەو شەرواڵت بداتێ و منیش کراست بۆ ئەهێنم، ئەو کراسە پەڵەی بۆیەی پێوەیە، عەیبدار بووە.

محە: بە ملی شکاویان ئەوە دەست و دیاریی سەرەو مالەیە!!!!!! ئەها.. شەرواڵەکەشی کونی تیایە.

بروسک: سەرە و مالە کێن؟ ناوی سەیری تیایە ئەم گوزەرە.

محە: ئەوانە گونی گوندار دەرئەهێنن ڕۆڵە، جارێ زۆرت ماوە بیانناسی.. ئەمما بە قسەی خاڵی خۆت بکە، خۆت مەیە لە قەرەیان.

بروسک: دەی خوا لە بەلایان بەدوورمانکا.. پێم بڵێ نانت خواردووە؟

محە: هەهەهە نانی چ وەختە، بانگی عەسریشی فەرمووە.

بروسک (( دەست ئەکا بە گیرفانیاو بڕێک پارەی ئەداتێ)): فەرموو ئەمە لەبری نانخواردنەکەت.. دوعای خێرمان بۆ بکە.

محە: لە بەڵا بەدوور بیت، ماڵت ئاوابێ و خوا بەزیادیکا.

(( بروسک ئەگەڕێتەوە جێی خۆی و چاکەی تەواو ئەکات و بە هێمنیی خواحافیزیی ئەکات و ئەڕوا.))

Cut

دیمەنی – ۲۰۹ – ڕ/ عەسر – ن – قاوەخانەکەی تریفە:

Mute

(( حەمە خدر۲، بە چاکەت و پانتۆڵەکەو سەرو ڕیشەکەیەوە (( کەسایەتی دووەمی)) دانیشتووەو خواردنەوەیەک ئەخواتەوە... پاش کەمێک سالم دێت و سڵاو لە تریفە ئەکا.. لە نزیکی تریفەوە لەسەر مێزێک دائەنیشێت و چاو ئەگێڕی، خدر تەواو خۆی سەرقاڵ ئەکا بە خواردنەوەکەی بەردەمییەوە))

Cut

دیمەنی – ٢١٠ – ڕ/ د – بەردەمی چایخانەکە:

Mute

(( بروسک تا لە چاوی کەسەکانی ناو چاخانەکە ون ئەبێ ورد ئەڕوا، پاشان زۆر بە خێرایی بەرەو کۆمپانیای زوبێر ئەگەڕێتەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٢١١ – متبوع – ڕ– عەسر/ن - کۆمپانیای زوبێر:

١-(( ئەکرێ پێش ئەم دیمەنە، یەک دوو دیمەنی بروسک هەبێت وەک تابع و متبوع، بۆ گەڕانەوەی بۆ کۆمپانیا.. کەمێک بە خێرایی بڕوات))

٢- (( زوبێر دانیشتووە، سەعاتەکە نیشان ئەدرێت پێنجی ئەوێ بۆ چوار ٣:٥٥ دەقیقە.. بروسک کەمێک هەناسەسوار دێتە ژوورەوە))

بروسک: مامە سەرەو مالە کێن؟

زوبێر (( خەندە )): سەرەو مالەت بۆچییە بروسک؟

بروسک: تۆ پێم بڵێ.

زوبێر: دوو سەرسەریی و شەللاتیی لای ڕێشارن.. خۆ ڕێیان پێ نەگرتووی؟

بروسک: نا مامە گیان، ئەو جلانەی کە لە ڕفاندنەکەما لەبەری دوو کەسەکەدا بوون، زایەیان کردووە، بە پیاوێکی هەژار ناوی محەیەو لە چایخانەکە بینیم.

زوبێر(( بە تەرکیزەوە گوێ ئەگرێ)): ئێ ئێ محە ناشوکرا!

بروسک: قسەم لێدەرهێنا ئەو جلانەی لەو سەرەو مالەیەوە پێ بەخشراوە.

زوبێر (( حەپەساو بە ڕاددەی تۆقین)): چۆۆۆۆۆۆن؟ یەعنی سەرەومالە تۆیان ڕفاندبوو؟ یەعنی ئیشی ڕێشار بوو نەک کەسێکیتر؟

بروسک: بەڵێ مامە گیان، بۆوا شڵەژای؟

زوبێر (( تەماشای سەعاتەکە ئەکات و سەعاتەکەی دەستی خۆیشی.. بە دەنگێکی ترساو)): ڕێژوان لێرەیە؟

بروسک: نا مامە، ئەوە چی ڕوویدا؟ مامە زۆر شڵەژایت.. ڕەنگت تێکچووە وریابە بۆ تەندروستیت باش نییە.

زوبێر (( لە کاتی قسەکانی ئەویشداو بە بەردەوامیی، بۆینباخی ئەکاتەوەو دەست بە سنگیا ئەهێنێت و بروسکیش هەر مامە مامەیەتی)): یەعنی دارەوان نەبوو؟؟؟؟؟ چۆن شتی وا ئەبێ؟ نابێت ڕێشار بووبێت.

بروسک: دارەوانی چی مامە گیان؟**!** مامە مامە.

(( زوبێر ئەبورێتەوەو بروسک لەگەڵ یەک دوو حەماڵ کە بانگیان ئەکا (( بەڵام خدری تیا نەبێ)) ئەیبەن بە مەبەستی نەخۆشخانە))

Cut

دیمەنی – ٢١٢ – ڕ- عەسر/ ن – قاوەخانەکەی تریفە:

(( ڕۆستەم دێتە ژوورەوە بۆ لای سالم))

سالم: ئەوە تۆ بۆ هاتی؟

ڕۆستەم: بیرم کردەوە، نەک کەسێکی چەکدار لەناو خەڵکەکەدا هەبێت و زەبرێکت لێ بوەشێنن.. من چاودێریی دەرگاو دەریشەوە ئەکەم.. چەندی ماوە؟

سالم(( تەماشای سەعات ئەکەن)): سێ دەقە، چواری ڕەبەق ئیشی خۆمان ئەکەین.

ڕۆستەم: وایە سێ دەقە.

(( خدر٢ بە کەسێتیی دووەمی هەڵئەسێت و ١٠٠ دۆلارییەک دائەنێت، تریفە ئەچێ بۆ ورد کردنەوەی لە ژوورەوە))

تریفە: ببورە وردەی ئەوەندە تیا نییە، ئێستا دێمەوە.

(( خدر ئەچێتە ئەودیوی دەرگا چاوەڕوانی ئەکا، کەمێک دوور لە دەرگاوە))

ڕۆستەم: ئەم ملۆزمە چی بوو پەیا بوو؟

سالم: هیچ نییە ئێستا باقیەکەی ئەداتەوەو دێتەوە شوێنەکەی خۆی و تەواو.

(( تریفە ئەگەڕێتەوە باقی بداتەوە بە خدر، ئەیبینێت لە دەرەوەیە ئەچێت بۆ لای))

# (( ئەڵقەی یانزە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٢١٣ – متبوع - ڕ- عەسر / بەردەرگای قاوەخانەی تریفە:

(( تریفە دێتە دەرەوەو خدر کەمێکیتر لە سەیارەکەی نزیک ئەبێتەوەو تریفە بە خێراتر بەرەو لای دێت))

تریفە: مەڕۆ کاکە مەڕۆ، بۆ کوێ دواتکەوم؟ باقیەکەت.

خدر: توخوا ببورە سایەقەکە پەلەیەتی ئەبێ زوو بگەڕێمەوە(( دەستە چەپی ڕائەهێڵێ بۆ باقیەکەو بە دەستە ڕاستیشی دەمانچەیەک لە سکی تریفە جووت ئەکات))

خدر: بێدەنگبە با تیانەچی.. بە ئەسپایی و بە هێمنیی سواری سەیارەکەبە، هیچ لاریم نییە بیتەقێنم. (( دەرگای دواوە بۆ تریفە ئەکاتەوە))

تریفە (( بە ترس و دەنگی نزم)): ئاخر تۆ کێییت برا؟

خدر: هەموو شتێ دوایی، تەنها سەرکەوەو ژیانت پارێزراوە.

(( تریفە سەرئەکەوێت و دواتر خدر.. سیارەکە بە خێراییەکی زۆر دەرئەچێ))

تابع —————— Cut ——————

دیمەنی – ٢١٤ – متبوع - گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٢١٢ - :

(( سالم و ڕۆستەم دانیشتوون، سالم دەمانچەکەی ئامادە ئەکا.. منداڵێکی ١٢ تا ١٥ ساڵ دێتە بەر دەرگاکەو بە دەنگی بەرز ئەقیژێنێ))

منداڵ: کاکە ئەو ژنەیان فڕاند، دوو کەس بوون.

(( دوو کەسەکەی ناوەوە، بە کلاشینکۆف یان هاوشێوەکەیەوە بە جوڵەی مغاویریانە، بەرەو دەرگا ڕائەکەن.. سالم و ڕۆستەم پێش ئەوان ڕائەکەن بۆ دەرگا، سالم دەمانچەکەی بەدەستەوەیە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٢١٥ – متبوع – گەڕانەوە بۆ بەر دەرگا لە دیمەنی – ٢١٣ - دا:

(( سالم و ڕۆستەم دێن و بە خێراییش دوو کرێکارەکەی قاوەخانەکە.. سەیارەی خدر لەچاو ون ئەبێت.))

ڕۆستەم(( بۆ منداڵەکە)): کابرا شێوەی چۆن بوو؟

منداڵ (( هەناسە بڕکێ)): قژی ڕەش و سەکسوکێکی ڕەشیشی هەبوو.

سالم(( بۆ ڕۆستەم)): ئەها ئەو کابرایە بوو کە ١٠٠ دۆلارییەکەی داناو تریفە چوو وردی بکاتەوە.

کرێکار١: ئێوە ئەیناسن؟

ڕۆستەم: نەوەڵا یەکەمجارە ئەیبینین.

(( لە میوتیدا هەندێک حوار))

Cut

دیمەنی – ٢١٦ – ڕ – عەسر / ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن لەسەر وایت بۆردەکە، هەندێ ناوی نوسیوەو هێڵی بۆ ڕاکێشاون))

نارەوەن (( لەبەر خۆیەوە)): بە دڵنیاییی، هەر ئەوەیەو هیچیتر.. ئەمە داوەو بۆ خدر چنراوە، تا بزانن ئەو ماکیاژانە بۆ کوێ ئەبا.. چەند خێری پێوە بوو نەمهێنان خوای گەورە.. ئەگینا ئەو کوڕە تیا ئەچوو.. ئای کە باش بوو وتی لای خۆم بۆت هەڵئەگرم.. زۆر سوپاس خوایە گیان کە ئەوەندەت ئەقڵ داینێ نەیهێنم... جا ئێستا چۆن ئەوەی پێ بڵێم؟ وتی عەسر تەلەفونم بۆ مەکە.. ئەو وریایە، با بە قسەی بکەم.. جا چی ئەبێ بۆی بکەم (( خۆی داماو نیشان ئەداتەوە)) نا، با عاجز نەبێ، نایکەم، هەر ئەوم هەیە هەواڵێکم پێ بڵێ.. چک.. ئاقڵانە لەگەڵ ئەم هەڵسوکەوت بکەم باشترە.

Cut

دیمەنی – ٢١٧ – ڕ- عەسر/ د - ناو سەیارەکەی خدر٢:

(( خدر٢و تریفە لە دواوە دانیشتوون، خدر دەمانچەی ئاراستەی سنگی تریفە کردووە))

خدر٢: ئێستا تەلەفونێک بۆ ئەو هەڵشۆیەی مێردت بکەو بڵێ منیان ڕفاندووە، هەر ئێستا بگەرەوە قاوەخانەکە، پێی بڵێ قاوەخانەکە دانەخا با خەڵک نەزانن شتێک هەیە، ئەگینا ئەکوژرێم.

تریفە (( پاڕانەوەو گریان)): بەخوا هیچم نەکردووە.. توخوا مەمکوژە.

خدر٢: خوشکێ گیان من تۆم لە کوشتن پاراست.. ئەو دووەی دانیشتبوون، نیازی کوشتنی تۆیان هەبوو، خۆم دەمانچەکەم پێ بینین خەریکی حازر کردنی بوون.. من ئەتبەمەوە بۆ ماڵی باوکت.. بەڵام ئەبێ هەفتەیەک نەیەیتە دەرەوە، تا بکوژەکەت بەڕاست پێی وابێ فرێنراویت. بێیتە دەرەوە ئەمجارە ئەکوژرێیت و کەسیش ناتوانێ بتپارێزێ.. دە ئێستا تەلەفونەکەت بکە خێرا.

تریفە (( ئەیەوێ دەستی ماچ بکاو خدر ناهێڵێ)): بە قوربانت بم براکەم، بە هەموو ژیانم پاداشتی تۆم پێ نادرێتەوە.

خدر٢: هیچ نییە، ئەزانم تۆ بێ گوناهیت.

تریفە: ئەی تۆ ماڵی باوکم ئەزانی؟

خدر٢: خەمی هیچت نەبێ خوشکەکەم، تەلەفونەکە بکە.

تریفە: باشە بەسەرچاو.

(( تریفە ژمارەی مێردەکەی لێ ئەدات و خدر٢یش دەمانچەکەی هەڵئەگرێتەوە))

ـــــــــ تابع ـــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٢١٨ – متبوع – ڕ- عەسری درەنگ – د – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

(( سەیارەکەی خدر٢ دێت و تریفە بە سوپاسکردنی زۆرەوە دائەبەزێت و خدر٢ دێتە پێشەوەو ئەڕۆن.. تریفە لە دەرگای ماڵی باوکی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ٢١٩ – ڕ/ د – لای چاخانەکە:

(( سالم و ڕۆستەم وەستاون))

سالم: باشە ئەو هەتیوە مۆبایلی بۆ داخراوە.

ڕۆستەم: چووزانم، نەگبەتیی ئێمە.

سالم: دە تۆ بچۆ بزانە لە چاخانەکە نییە؟

ڕۆستەم: ئەی خۆی پێی نەوتین لێرە وا خۆتان دەرمەخەن، کە ئەمناسن؟

سالم: خۆی سەری دای لە بەرد.. ئێستا کاتی ئەوەیە؟ من خەریکە تێک ئەچم.. تۆ بڵێی مامۆستا خۆی خەڵکیتری ڕانەسپاردبێ بە زیندوێتیی دەستی بکەوێ؟

ڕۆستەم: یەعنی خۆی فڕاندبێتی؟

سالم: ئەی بڵێم چی؟ ئەگینا خەڵک بۆچی داماوێکی وا ئەفڕێنن؟ من نازانم خەریکە مێشکم ئەتەقێ.. هەرچییەک بە مامۆستا بڵێین، دڵنیابە باوەڕمان پێ ناکا.. تۆ بچۆ بزانە خدر لەوێ نییە؟

ڕۆستەم: الحکم للە.. باشە وا ئەچم.

(( ڕۆستەم نیشان ئەدرێ تا دەمی چایخانەکە ئەچێ))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٢٢٠ – متبوع – ڕ- عەسر – ن – ناو چایخانەکە:

(( ڕۆستەم چاو ئەگێڕێت و گوێی لە قسەکانی هاوڕێ و ئەردەڵان ئەبێ))

هاوڕێ: ئەی حمەخدر لە کوێیە حمەخدر؟ ئێستا کوێ بگەڕێم بەدوایا؟

ئەردەڵان: خوا ئەزانێ کامیان ناردوویانەتەوە بۆ ماڵەوە ئیشی ژنەکانیان بکا، سەرژنانییە!

هاوڕێ: دە یەک دەقە با دایخەم و خۆم و خۆت بە تەکسییەک ئەڕۆین.

ئەردەڵان: خوا ڕەحمی پێ بکا، جا خۆ فیایکەوین باشە.!

هاوڕێ(( بۆ ڕۆستەم)): ببورە کاکە هیچمان نییە دایئەخەین.

ڕۆستەم: ئەوە خێرە کاکە چی بووە؟

ئەردەڵان: ئەو مامۆستا زوبێرەکە هەیە، خاوەنی ئەو کۆمپانیایە(( ئاماژە ئەکا)) داماوە جەڵدە لێیداوە لە خەستەخانەیە.

ڕۆستەم: خوا ڕەحمی پێ بکا ئیشەڵڵا.

(( ئەگەڕێتەوە بۆ لای سالم، ئەوانیش خۆیان کۆ ئەکەنەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٢١ – ڕ- عەسر / د – بەر ماڵی خدر:

(( خدر بە جلی ئاسایی خۆیەوە دێتەوە دەرەوە بەرەو ئیش، تێل ئەکا ))

خدر: تەلەفونت زۆر کردبوو ڕۆستەم؟ چی بوو؟ تەواوتان کرد؟

ڕۆستەم(( دەنگ )): کورە تەواوکردنی چی؟ تۆ وەرە بۆ بەر فریاکەوتن لەوێ بۆت باس ئەکەین.

خدر(( تعجب )): فریاکەوتن بۆ؟

ڕۆستەم: ئەی ئێمە ئیشەکەمان بۆ نەکرا، وا بزانم مامۆستا ئەوەی بیستووەو جەڵدە لێیداوە.

خدر(( حماس )): ئەوە بە ڕاستتە؟ وا هاتم هەر ئێستا ئەگەمە لاتان.

(( زۆر بە خێرایی بەرەو تەکسی ئەڕوات ))

Cut

دیمەنی – ٢٢٢ – ڕ/ن – ژووری نەخۆش – نەخۆشخانە:

(( زوبێر بێتاقەت و دەنگ کز دانیشتووەو بروسک و ڕێژوان بە دیاریەوەن))

زوبێر: هەر نەهاتن؟

ڕێژوان: نەخێر نەهاتوون، ئێستا ئەچینەوە کۆمپانیا ئەیانبینی.

زوبێر: هیچ کێشەم نەماوە؟

بروسک: نا هەر بورانەوە بوو، من لە جەڵتە ترسام خوانەخواست.. بەڵام قسەی سەیرت ئەکرد مامە.

زوبێر: وەک چی؟

بروسک: نازانم ئەتوت ڕێشار بوو دارەوان نەبوو؟

زوبێر: نازانم، دیارە ورێنەم کردووەو ئاگام لە خۆم نەبووە.

(( چیمەن هەندێ شتی کۆکردۆتەوە دێتە ژووترەوە))

چیمەن: جل و بەتانییەکەم بردەوە.

ڕێژوان: خەڵکێکی زۆر لەبەردەرگایە، چییان پێ بڵێم؟

زوبێر: پێیان بڵێ.................

تابع ——— Cut

دیمەنی – ٢٢٣ – متبوع – ش/ن – نەخۆشخانەی فریاکەوتن- بەردەرگا:

(( هەندرێن و ئەردەڵان و خدرو هاوڕێ و ڕۆستەم و سالم، تاک و لۆ یان هەموو پێکەوە لە بەردەرگای خەستەخانەن.. پاش کەمێک ڕێژوان دێتە دەرەوە بۆ لایان))

ڕێژوان: برادەران زۆر سوپاس عەزێتتان کێشا، خوا لە کەسایەتیتان نەکا، ڕەحمەتتان لێ بێ بفەرموون بڕۆنەوە، تۆزێکیتر باوکیشم ئەگەڕێنینەوە بۆ ماڵەوە، هیچ نەبوو کەمێک شەکرەی بەرز ببۆوە.. ماڵتان ئاوابێ زۆر سوپاستان ئەکەین، وا ناهێڵن کەس بێتە ژوورەوە. ببورن تکایە.

هەندرێن: کاکە نەک شتێک پێویست بێ با یەک دوانێکمان بمێنینەوە.

ڕێژوان: قوربانتان زۆر سوپاس، نەوەڵا، وا چیمەن و بروسک حازری ئەکەن بیهێننە دەرەوە، منیش سەیارەکە حازر ئەکەم.

ڕۆستەم: دەی ئیشەڵڵا باش ئەبێت و سبەی دێینە خزمەتی.

ڕێژوان: نا، تۆ مەڕۆ ئیشی پێتە، وتی با خێرا ڕۆستەم بێت بۆ لام ئەگەر لەوێیە.

(( خواحافیزیی و دوعای خێر بۆ کردن و سوپاسی ڕێژوان.. جەماعەت ئەڕۆن و ڕێژوانیش ئەچێ بۆ سەیارەکەی، ڕۆستەمیش بۆ ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٢٤ –ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن و دارەوان و ئامۆو ئاواو تیرۆژو تریفە))

ئامۆ: کەسێک شک نابەم ڕقی لە ئێمە بێ، گەر هەشبێ تریفە زۆر دوورە لە هەموو شتێکەوە، بۆ ئەو؟

دارەوان: ئەوی چوو چوو.. باسی ئێستا بکەین باشترەو دواتر بە شێنەیی ئەیدۆزینەوە، پەلە مەکەن.. گرنگ ئەوەیە نەهێڵین ئەوە ڕووبداتەوە.

نارەوەن: خۆم ئەیدۆزمەوە، کەستان سەری خۆتان بەوەوە مەیەشێنن.. لە ڕێشارە لوتسرپیش زیاتر نییە، من ئەزانم.. ئەوە ڕۆژەکەیە وتم.

ئاوا: وەڵڵاهی دەربکەوێ هەر کەسێکە، دەستی بە ئاسمانیشەوە بێ ................

دارەوان(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): هەڵمەچۆ بابە وەختی ئەوە نییە.

ئاوا: دەی بەخوا هەرکەسێ بووبێت، بە دەستی خۆم ئەیکوژم.. چۆن هەڵنەچین باوکە؟ خۆ ئەگەر ئەو خێرخوایە نەبووایە، هەیهوووووو

دارەوان: تۆ لە سبەینێوە تیرۆژ بگەیەنە زانکۆو (( بۆ تیرۆژ)) تۆش بە تەلەفون پێشتر کاتی هاتنە دەرەوەتی پێ بڵێ، (( بۆ ئاوا)) پێش دەرچوونی لەوێ بە.

(( تیرۆژو ئاوا، بەسەرچاو ئەکەن))

تریفە: ئەی دایکم؟

نارەوەن: ڕۆڵە هەر ئەوەندەم بەسە بەو زەنگە ئاگادار کرامەوە، خەمی منتان نەبێ.

دارەوان: ئامۆ تۆش هەرکاتێ دایکت و تریفە تێلیان بۆ کردیت، وریابەو بەخێرایی بگەرە لایان.

نارەوەن: من سبەی هەوڵی تەواو ئەدەم بۆ دۆزینەوەی.. خەڵک هەیە ئیشم بۆ بکەن.

دارەوان: ئارام بگرەو هەڵە مەکە.. خۆم سۆراخی تەواو ئەکەم و هیچم لێ ون نابێ.

دارەوان: هەر سبەی ئامۆ سەیارەیەک بدۆزێتەوەو پارەکەی ئەدەمێ بیکڕێ.

تریفە: ئەی من چی؟

دارەوان: تۆش وەک ئەو کابرایە پێی وتووی، ئەم هەفتەیە لێرە ئەبی، با هەڵشۆ لە قاوەخانەکە بێت و پێی بڵێ نەیەت بەمناوەیا، با گومان نەکرێ لێرەی. ئەو کابرایەی ڕزگاری کردووی کەم نییە، یا لە پۆلیس و ئاسایشە، یان نزیکی منە.. ئەویش ئەدۆزمەوە.

تریفە: باوکە زۆرم پێوت تۆ کێیت و بۆ ڕزگارم ئەکەی؟ هەر پێی نەوتم، ئەیوت ئەزانم بێ گوناهیت، ئێ وەڵا هیچم نەکردووە.

دارەوان: نا کچم تۆ هیچت نەکردووە، هێنانەوەت بۆ ماڵی ئێمە پەیامێکە بۆ من.. ئەو کابرایە مەبەستی ئەوەیە بە من بڵێت، هەوڵی کوشتنەکە لە دژی من دراوە، نەک تۆ شتت کردبێ.

نارەوەن (( تورە)): وەڵاهی بدۆزرێتەوە هەرکەسێکە، ئەبێ ژەمی دوای ئەوەی کە ئەیبینم، لە گۆڕا بێ.

دارەوان: ڕەنگە ڕێشار بێ؟!

نارەوەن: هەر ئەو دەرئەچێ، هەر ئەو ڕقی لێتە.

دارەوان: نا ڕەنگە کەسێکی نزیکی خۆم بێ و ئەوە بزانێ کە لەگەڵ ڕێشار ناکۆکم، ئەو هەلە بقۆزێتتەوە.. یان چوزانم، ڕەنگە هەر کابرای فڕێنەر بۆ خۆ نزیک کردنەوەی لە من، ئەمەی کردبێ و مەسەلەی کوشتنی تۆ، ئەسڵ و ئەساسی نەبێ.. چونکە بەڕاستی کەس شک نابەم، ڕقی گەیشتبێتە ئەو ڕاددەیە.

تریفە: وەڵا باوکە ئەوە ڕێی تێ ئەچێ.. ئەو دووەی ئەو باسی کردن، کە بە نیاز بووبن بمکوژن، دوو پیاوی زۆر باش بوون، ماوەی چەند ڕۆژێکە زوو زوو دێن و لای من نان ئەخۆن، هیچ هەڵەو خراپەیەکم لێ نەبینیون.

دارەوان: ئەو دووەی ئەو باسی کردن، چەند ئەبێ هاتوچۆی ئەو شوێنە ئەکەن؟

تریفە: وەڵا تەواو نازانم، بەس چوار پێنج ڕۆژ، تۆ بڵێ هەفتەیەک ئەبێ.

دارەوان: دەی قسەی کابرای ڕزگارکەرت تەواوە.

ئامۆ: ئەی وایە، دیارە ئەم ماوەیەی دەرکەوتوون، بۆ چاودێریی کردنت هاتوون.

نارەوەن: ئەک ناوجەرگیان بەئاو بێ.

دارەوان: ڕیک وایە.. کەواتە کەسێک هەیە، هەر بە جددیی ویستبێتی بتکوژێت.. دەی.. من ئەچم سەرێکی زوبێر ئەدەم، لە خەستەخانە دەرچووە.. وریابن ئەم باسە هیچ کەسێک نەیزانێ، لە دەمتان نەیەتە دەرەوە ها!!!

نارەوەن: دە بڕۆ ئاگات لە خۆت بێ نەک ئەمجارە تۆ بکوژن.

(( لە خواحافیزیی و لەبەر هەستان و بەسەرچاو باسنەکردنی لای خەڵک، دارەوان ئەڕوات، ئامۆش پێی باشە بچێ لەگەڵیداو دارەوان ناهێڵێ))

Cut

دیمەنی – ٢٢٥ – ش/ن – ماڵی سەلوا:

(( ماڵێکی هەژار، قەنەفەی تیا نییەو لەسەر دۆشەک دانیشتوون.. سەلواو تافان و هەندرێن و کلێپەو بالا))

تافان: ئەی بۆ نا؟ وەڵا با سەلوا بێتەوە ماڵی خۆمان، هەم ئیشەکانمان بۆ ئەکاو هەم منالێش بەرێ ئەکا بۆ مەکتەب.. کە ئێمەش هاتینەوە، بچێتەوە ژووری خۆی.

سەلوا: ئەی مانگانەی چەندم ئەدەیتێ؟

تافان: ئەیرۆ مانگانەی چی؟ سەلوا.

سەلوا: ئەوەی تۆ ئەیلێی، ئیشی کارەکەرە دایکەکەم، نەک دش.

هەندرێن: ببورە سەلوا گیان، مەبەستی ئەوە نەبوو، چونکە خۆیشی لە ماڵەوە هەر لەگەڵتا ئەبێ.

تافان: ئەی کۆمپانیا؟

هەندرێن: ئیتر ناچیتەوەو منیش ناچمەوە.

تافان: وەڵا کەس ناتوانێ ڕێم لێ بگرێ، ئەچم، یەعنی هەر ئەچم.

هەندرێن: جوانە! لەوەتای مێردەکەت ئەبینی لەگەڵ حەمالا نان ئەخواو تۆش لەگەڵ بەگ و ئاغاواتا، ئیتر حسابمان بۆ ناکەی تافان خان.

تافان: ئەتتوانی قبوڵی نەکەیت و بەر شەقت بدایە؟ (( هەندرێن بێدەنگ)) کەواتە لە ماڵیشەوە دەم لە من گەرم مەکە. لەوێ پیاو بوویتایە.

هەندرێن: یەعنی بە پیاویشمان نازانی؟

تافان: هیچ پیاوەتییەکم لێت نەبینی.. هههە تەنانەت نەیهێشت لە سەیارەکەی ئێمەشدا سەرکەوی، حسابی هیچی بۆ نەکردی و فزەشت لە دەمەوە نەهات.. بە ڕاستی ئەوەیە پیاو!

هەندرێن: ئاوا؟

سەلوا: توخوا بەسیەتی بیبڕنەوە، کاکە من هەر نایەم بۆ ماڵی تۆ، هەر لێرە بە تەنیا ئەژیم.

تافان: تۆش بۆ ئەوەی هەر داماندۆشی و کرێ خانووت بدەین و خەرجییت بکێشین.. (( دەست ئەداتە دۆشەکەکەی ژێری)) توخوا بەمەش ئەڵێی ماڵ؟ باوکە سواڵکەرەکەت تا مرد، نانێکی بە دڵی خۆی نەخوارد.

سەلوا: ئیتر بڵێین چی؟ شوکرم بە بەشی خوا، کە وا بێدەنگی کردووم لە ئاستی تۆیا.

هەندرێن: تافان بچۆرەوە بۆ ماڵەوەو جلوجۆرت کۆکەرەوەو یەکسەر بۆ ماڵی باوکت.. دەبڕۆ تەڵاقت کەوتبێ.

سەلوا: ئا ئا ئا کاکە!!!! (( مناڵ ئەگرین))

تافان(( پێکەنینی ئیستیفزازی)): هههە هەی هەی پیاو کۆکی.. چەکی قورسی بەکارهێنا... کورە تەڵاق بەدەست من بووایە، دوو ساڵیش بوو ئەبووایە لەم سواڵکەرخانەیە بوویتایە. هەستن کلْپەو باڵا، پێشمکەون.

هەندرێن: یەک مناڵ نابەیت.

تافان: مناڵێ لە تۆ بێ، ئەوە هەر نەمویست، تا لە دادگا مەرحەبات ئەکەمەوە ئەگەر ڕام گۆڕی وەریان بگرمەوە!

هەندرێن: دە فەرموو بۆ دەرەوە.

(( مناڵ بەدوای دایکیانا ئەگرین و دوای ئەکەون.. هەندرێن بەردەمیان لێ ئەگرێ و تافان ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٢٢٦ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار تێل ئەکا.. گرژە ))

ڕێشار: ئەمرەکەی پاشا گیان، بەسەرچاو...... نا نا بێخەمبە. (( بێتاقەت ئەبێ و سەربائەدا... تەلەفونێکیتری بۆ دێت، بە بێتاقەتیی وەڵام ئەداتەوە)) بەڵێ تافان خان...... توخوا خۆم کێشەم کەمە گوێ لە تۆش بگرم؟........ کەیفی خۆتانە، ئەوە کێشەی ئێوەیە، هی من نییە...... جارێکیتریش بە شەو تەلەفونم بۆ مەکە، هەرچییەکت هەبوو بە ڕۆژ لە کۆمپانیاو بەس. (( مۆبایل دائەخاتەوە)) تەلاقیداوی نەداوی، چاوی هەردووکتان دەرئەهات.

ڕەحمان: گەورەم کاک کرمانج گەیشت.

ڕێشار: با بێ لەسەر چی وەستاوە؟

ڕەحمان: من پێموت تەلەفونی لەگەڵایە.

ڕێشار: ئەک ملی تۆ شکێ ڕەحمانیناموبارەک.. با خێرا بێت.

ڕەحمان: ئەمرەکەی گەورەم.

(( کرمانج دێتە ژوورەوەو سڵاو ئەکات و ڕێشار جواب ناداتەوە ))

ڕێشار: کرمانج ئەڵێن هەوڵی کوشتنی کچی دارەوان دراوە.. ئەو ماڵە هەرچییەکیان بەسەر بێت، بەرۆکی ئێمە ئەگرن. تۆ ئەوە ئەزانی؟

کرمانج: ئۆوا!! ناڵێن کێ هەوڵیداوە؟

ڕێشار: چاویان دەرئەهات هەرکەسێکە.. ئەوە پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.. ئێمە ئەبێ ئەو ماڵە بپارێزین، تا بەڵایەکیان بەسەر نەهێناوین.

کرمانج: جا فەرمانت بەچییە گەورەم؟

ڕێشار: کچێکیان لە زانکۆیە، لە سبەینێوە دوور بە دوور بە سەرەو ماڵە بلێ، لە چوونیەوە بۆ زانکۆ تا ئەگەڕێتەوە، پاسەوانیی بکەن، هەر شتێک ڕوویدا بە پەلە فریایکەون.

کرمانج: فەرمانتە گەورەم.

ڕێشار: هەر سبەی دوانیتریشم بۆ بە کرێ بگرە.. دوور بەدوور پاسەوانیی ماڵەکەیان بکەن، بە بێ ئەوەی خۆیان و دەرودراوسێش پێ بزانن. تا لەو نزیکانە خانوو جۆر ئەبێ.

کرمانج: فەرمانتە، ئەی کاک دارەوان نەپارێزین؟

ڕێشار: نا خەمی ئەوتان نەبێ.

کرمانج: هەر ئەوەندەن کەسیتریان نییە؟ ئەی کچی قاوەخانەکەیان، ئەوەی ئاوەکە لێرەوە ئەبەن؟

ڕێشار: بەسیەتی پرسیار، هەر ئەوەندەیەو بەس.

کرمانج: فەرمانتە گەورەم، هەر لە ئێستاوە وا بزانە هەمووی جێبەجێ کراوە.

Cut

دیمەنی – ٢٢٧ – ش/ن –ماڵی هەندرێن:

(( تافان تەلەفون دائەخاتەوەو بە ڕانی خۆیا ئەکێشێت و ئەگری))

تافان: لە کۆمپانیا وەک سەگ کلکە لەقێمان بۆ ئەکات.. کەچی کە تێلی بۆ ئەکەم، ئەڵێی بە ژیانی نەیناسیوم.. ئای خوایە گیان چەند خوێڕی بوو (( گریان)) ماڵی خۆشم کاولکرد!!!.. خوایە گیان بمبەخشە ئەو سەرسەرییە سەری لێشێواندبووم، بۆیە ئەوەم کرد.. ئەی هاوار ئەی منداڵەکانم؟ هەمووم جێهێشت (( گریان)) نا.. ماڵ جێناهێڵم و بە قسەی ئەکەم، لە بەیانییەوە ناچمەوە کۆمپانیا.. داوای لێبوردنی لێ ئەکەم.. خوایە گیان فریامکەوی!!!

(( گریان و سەرنان بە دیوارەوەو بە سوکیی پیاکێشان))

Cut

دیمەنی – ٢٢٨ - ڕ/ د – ناو سەیارەی ئاوا:

(( ئاوا تیرۆژ))

تیرۆژ: زۆر باشە من موحازەرەیەک پێش ئەوەی تەواوبم، تەلەفونت بۆ ئەکەم، بەس توخوا کە هاتی ڕێک مەیە بەر دەرگای زانکۆ لەبەر هاوڕێکانم.

ئاوا: ئینجا چی تیایە، بڵێ براکەمە، ئەوەش قەدەغەیە.

تیرۆژ: بە دڵنیایی ئەزانن برامی، بەڵام ڕەنگە وا بزانن، لەماڵەوە متمانەم لەدەستداوە بۆیە برا ئەنێرن بە شوێنما بمباتەوە.

ئاوا: ئای تیرۆژ، چەند سەیر بیر ئەکەیتەوە.

تیرۆژ: ئاوا گیان ئیتر زانکۆیەو خۆت نازانی شارێکی چەند بە قسەین.

ئاوا: بەڵێ باشە قوربان.. سەرچاو، لە دوورەوە ئەوەستم.

(( سەیارە بەرەو زانکۆ ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٢٢٩ - ڕ/ن- ماڵی دارەوان:

(( خدر بەرامبەری نارەوەن لەسەر قەنەفەیەک دانیشتووە))

خدر: بەخوا با ئیتر نەیەم، باش نییە.

نارەوەن: نا بەقوربان، هەرکەس پرسی، بڵێ ئاڵوگۆڕی بە قەنەفەکان کردووەو منی بانگ کردووە، بەڵام هەرکەس پرسیاری لێکردی، یەکسەر پێم بڵی پرسیارم لێکراوە، بۆ ئەوەی بۆ جاری دووەم شتێکیتر بڵێین.

خدر: بەڵێ باشە.. ئەوەی پێشت وتم، سەرسەرو سەرچاوم.. من بە وردیی بە شوێنیا ئەگەڕێم... ئەی کچەکەت لە کوێیە؟

نارەوەن: لە حەمامە.. بەس خدر گیان هەرچیت کردووە، نابێ زۆر بخایەنێ.

خدر: هەوڵ ئەدەم بەسەرچاو.

نارەوەن: یەک دەقە چاوەڕێمکە.

خدر: پارە نەهێنی نارەوەن خان.. بەخوا پێویستم پێی نییە.. (( نارەوەن ئەیەوێ بڕوا)) کچی تۆ وەرە پێت بڵێم.

نارەوەن(( ئەگەڕێتەوە))چیم پێ ئەڵێی؟

خدر: ژوورەکەم بە تەواوەتیی گۆڕی.

نارەوەن: دە توخوا من لە چیام و ئەو چیم پێ ئەڵێ؟ تۆ بوەستە یەک دەقە (( ئەچێت لە ژوورەوە پارە ئەهێنێ و بڕێکی ئەداتێ)) ئەمە وەرگرە.

خدر: تۆ خەجاڵەتم ئەکەی.

نارەوەن: ئەو قسانە مەکە، من بکوژی کچەکەمم لێت ئەوێ، ئەگینا ئیتر هاوڕێش نابین.

خدر: تکایە پەلەم لێ مەکە.. تۆ ناتەوێ بکوژی کچەکەو فریادڕەسەکە بهێنمە خزمەتت؟

نارەوەن: ئەی چیم ئەوێ بەساقە؟.. جارێ ئەو فریادڕەسەم بۆ بدۆزەرەوە... ئەوەم زۆر بەلاوە مەبەستە، ئەو نەبووایە ئێستا لە پرسەدا بووین.. ئەوسا ئەو دووەی تریش.

خدر: دەی دڵنیابە هەرچیت بوێ لەخزمەتدا ئەبم، بەس تۆ ئەو ئیشانەم بۆ بکەو لای کەس، هیچ کەسێکیش ئەم باسە ناکەی.

نارەوەن: کورە دەبڕۆ، چ شتێکت بیستۆتەوە.. هەرچی لە نێوانماندایە هەزارجارمان وت نهێنییەو تەواو، ئیتر هەموو جارێ مەیڵێرەوە ناخۆشە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ هەیەو خواحافیزیی خدر))

Cut

دیمەنی – ٢٣٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار- مەخزەنی ئاوبارکردن:

(( ڕێشارو یەکێک لە کوڕەکانی قاوەخانەکە، کە کارتۆنێک ئاوی پێیە، دێنە ناو مەخزەنەکەوە.. کوڕەکە کارتۆنە ئاوەکە ئەخاتە ناو پیکابە دوو طنییەکەوەو بە پەلە دوو کارتۆن ئاویتر ئەخاتە سەری.. لە دیمەنەکەدا هەردوو کوڕی قاوەخانەو ڕێشار هەیە، ئاوەکانیتر بار ئەکەن.. پاش کەمێک ڕێشار دێتە دەرەوەو کرمانج ئەبینێ))

ڕێشار: ئەوە ئاوەکان بار ئەکەن، تۆ بچۆ لایان، لە حەددی خۆی زیاتر نەبێ.

کرمانج: من نازانم حەددی خۆی چەندە گەورەم، هەر خۆت ئاگاداری ئەم کاروانی ئاوەیت.

ڕێشار: دەی باشە خۆم سەرەوکارییان ئەکەم.

کرمانج: ئەڵێی لە ئاوەکانی ژوورەکەی خۆشت داونەتێ، بینیم کارتۆنێکی پێ بوو لە دواتەوە ئەڕۆشت.

ڕێشار: کارتۆنێک لە ژوورەکەم زیاد بوو، وتم با بگەڕێتەوە مەخزەن.. باشە تۆ بچۆ بەلای ئیشتەوە، وا من لێرەم.

(( کرمانج بە ڕەزامەندییەوە ئەڕوات و ڕێشاریش لە ناو دەرگاکەدا ئەوەستێت و لە دواوە دیقەتی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ٢٣١ – ڕ/ن -ماڵی هەندرێن:

(( تافان کە سوسەی هاتنەوەی هەندرێن ئەکا، بە پەلە لەسەر قەنەفەیەک خۆی ئەکا بە خەوتوو و بەتانییەک بەخۆیا ئەدا.. هەندرێن و سەلواو کڵپەو باڵا دێنە ژوورەوە.. هەندرێن کە چاوی بە تافان ئەکەوێ، گرژ ئەبێ.. مناڵەکان ئەیانەوێ بچنە لای دایکیان، هەندرێن ناهێڵێ.. هەندرێن ئەچێتە نزیکیەوەو بە دوو پەنجە هەڵی ئەسێنێ))

هەندرێن: نەمووت بچۆرەوە بۆ ماڵی باوکت؟

تافان(( هەردوو دەستی هەندرێن ئەگرێت)): هەندرێن گیان شەو من هەڵەم کرد داوای لێبوردن ئەکەم.. بەقوربانت بم عەفومکە.

هەندرێن: هەڵە مەکەو داوای لێبوردنیش مەکە، تۆ ئەزانی چ سوکایەتییت پێ کردین؟

تافان (( ئەچێت سەلوا ماچ ئەکات)): قوربانت بم سەلوا گیان، ببورە هەموو کەسێ هەڵە ئەکا، من لە پێشا داوای لێبوردن لە تۆ ئەکەم.

سەلوا: خوا ئەکا ئێوە پێکدێن و تەبا ئەبن، من هیچ لە دڵ ناگرم.

((تافان ئەگەڕێتەوە بۆ لای هەندرێن و ئەیەوێ باوەشی پیا بکا، هەندرێن دەست ئەهێنێتە ڕێگەی))

هەندرێن: هەروا بە ئاسانیی دڵت چاکبوو؟ خۆ من هەر کوڕە سواڵکەرەکەم.

تافان: هەزارجار داوای لێبوردن ئەکەم، دەستت ماچ ئەکەم هەندرێن، بەخوا ئەعصابم گەرم بوو، ماندووی تەعزێکە بووم. هەرچی تۆ بیڵێی من ئەیخەمە سەر سەرم.

هەندرێن: تازە تەڵاقم دایت، چاکبوونەوەی نییە.

تافان: ئەوە چارەسەر ئەکرێ لە دادگا، یەک تەڵاقتدام و یەکجار ووتت، تۆ بەس لێم ببورەو هیچیتر. بەخوا ئیتر ناچمەوە کۆمپانیاش.

باڵا: دە توخوا باوکە لەبەر خاتری من لێی خۆشبە.

کڵپە: دەی توخوا باوکە ئاشت ببنەوە.

سەلوا: کاکە هەموو کەسێک قابیلی هەڵەیە، گرنگ ئەوەیە دانی پیا بنێ، ئیتر هیچی تیا نامێنێ.

(( دیالۆگی بەردەوام لە میوتیدا، دواجار هەندرێن دەستێک بەسەری تافاندا ئەهێنێ و سەری ئەنێ بە سنگیەوە، ئەویش ئەیەوێ دەستی ماچ بکا، هەندرێن ناهێڵێت.. منداڵ لە خۆشیا هەڵئەبەزنەوە))

Cut

دیمەنی – ۲۳۲ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێر دەستی لەژێر چەنەیەتی و دارەوانیش دانیشتووە))

دارەوان: ئیتر ئاوایە، بەڵێ تریفە لە ماڵی خۆمانە.

زوبێر: ئەی بۆ ناچێتەوە ماڵی خۆی؟

دارەوان: کاکە ئێمە بێکەسین، ئەوا کوشتیان، قوڕی کوێ بەسەراکەین؟

زوبێر: ئەی ئێمە کەست نیین برا؟ حەز ئەکەی خۆم و ڕێژوان و بروسک ئەچین پاسەوانیی ئەکەین.

دارەوان: ماڵی تۆ ئاوا بێت ممنونم پێی ئەزانم.

زوبێر: ئەی مێردەکەی ناتوانێ ئاگای لێی بێ؟

دارەوان: شتێکی لێ ئەکەین، بزانم ئەمڕۆ ئەچم لەگەڵ هەڵشۆی مێردیشی قسە ئەکەم، بەڵکو بتوانێ خۆی تەرخانکا بۆ ئەو، بەلانی کەمەوە لەم ماوەیەدا.

زوبێر: تکایە هەرچییەکیش بە من ئەکرێ پێم بسپێرە.. هەرچییم هەیەو نییە لەبەردەستی خۆتایە.

دارەوان: خوا بۆ منت بهێڵێ زوبێر گیان، پەک لە پارە ناکەوێ.

زوبێر: کچەکە سەیارەی هەیە؟

دارەوان: نا گەر گەڕایەوە ماڵی خۆی، بۆی ئەکرم.

زوبێر: باشترین و جوانترین سەیارەی بۆ بکڕە، ئەوە دیاریی منە.

(( دایالۆگ بەردەوامە لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٢٣٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( بێستان لە بەردەم ڕێشار وەستاوە))

ڕێشار: دە تۆ دانیشە، بۆ بە پێوە ئەوەستی؟

بێستان: نا زۆر سوپاس، ئەگەر نایەت، بەڕاستی منیش ناتوانم بە تەنها بێم.

ڕێشار: دە بوەستە با تەلەفونێکی بۆ بکەم.

ڕێشار(( تەلەفون بۆ تافان ئەکا)): ئەلو تافان گیان چۆنی؟

تافان ((دەنگ)): زۆر سوپاس کاک ڕێشار، من باشم، بەڵام تکایە من ژنی مێرددارم کاکەی من، تەنها لە کۆمپانیا ئەتوانی قسەم لەگەڵدا بکەیت و بەس.. تکایە لە دەرەوەی کۆمپانیا زەنگم بۆ مەکە.

ڕێشار: جا من بۆچی زەنگم بۆ کردووی؟ هەر بۆ ئیشی کۆمپانیا نییە؟

تافان: فەرموو ئەوە هەندرێنە قسە لەگەڵ ئەوا بکە.

هەندرێن(( دەنگ)): فەرموو!!!

ڕێشار ((تورە)): ئەوە چیتانە ناهەندرێن خۆت و ژنت ئیزرابتان کردووەو نەهاتوونەتەوە بۆ دەوام؟

# (( ئەڵقەی دوانزە))

هەندرێن: کاک ڕێشار خەڵک لە شوێنێک ئیش ئەکا، کە ڕێزی لێ بگیرێ.

ڕێشار: جا بۆ ڕێزت نەگیراوە؟ لە هەقی خۆتان زیاترم نەداونەتێ؟

هەندرێن: پارە چییە؟ پارە هەموو شتێ نییە برا.. ڕێزگرتن ئەوە بوو، لەو سەفەرەدا کردت؟ لەگەڵ ژنەکەم دائەنیشی بۆ نانخواردن و ناڵێی ئاخر ئەوە مێردیەتی با بهێڵم لەسەر مێزەکە دانیشێ، پێم ئەڵێی بڕۆ لەگەڵ حەماڵەکە دانیشە؟

ڕێشار: جا چیی تیایە؟

هەندرێن: وایە لای تۆ هیچی تیا نییە، بەس کاک ڕێشار دڵنیابە ئەو کەسە نیم لە ئاستی چاوەڕوانیی تۆدابم. نە من و نە تافانیش، هیچمان نایەینەوە بەو کۆمپانیایەدا.

ڕێشار (( تەماشایەکی بێستان ئەکاو بە دان بەخۆداگرتنەوە)): نا.. نا کاکە هەندرێن، ئەوەندە خێرا بڕیار مەدە.. باشە کاکە گیان وەرنەوەو هەموو شتێک بە دڵی خۆت بێ، هەر تۆ عاجز مەبە!!!!

هەندرێن: ئێمە مناڵی هەژارین کاک ڕێشار، پارە هەموو شتێک نییە لای ئێمە، ئەوەندەمان هەبێ بژین، سەرو زیادمانە.. ناشمەوێ هەموو شتێ بە دڵی من بێ.. تەنها ئەوەندە هەیە لە بارەی تافانەوە بزانە ئەوە هاوژینی منەو ڕێزی ئەوەم بۆ بهێڵەرەوە، ئەو کارمەندێکە لای تۆو هیچیتر.

ڕێشار: باشە بەسەرچاو.. لەمەولا وا ئەبێ و هەرواشە، ئێوارەش کە تێلی بۆ کردم و وتی هەندرێن تەلاقیداوم، من ئەوەم تێگەیاند کە ئەو تەنها کارمەندێکەو هیچیترو ئەو کێشەیە پەیوەندیی بە منەوە نییە.. باشە کەواتە ئەمڕۆ پشوو بن و سبەی وەرنەوە.

هەندرێن: بەڵێ باشە، بەو مەرجەی وتمان، هەردووکمان دێینەوە.

ڕێشار (( توڕە، تەلەفون دائەخاتەوەو دایئەنێ)): باشە کاک نا هەندرێن، مەرجت سەرچاوم.

بێستان: تەلاقیداوە؟ ئەی ئەوە نییە پێکەوەن؟

ڕێشار: جا کەس سەر لەم خەڵکە دەرئەکا؟! (( زەردەخەنەی کاڵ)) هههە تۆش ئەمڕۆ بڕۆوە دادەی من، سبەی وەرەوە (( خواحافیزیی و ڕۆشتنی بێستان)) وەڵا کاک هەندرێنیش زمانی گرت... ها ها ها جا ڕێشار بۆ نامری؟!.. ئەگەر پاشا ڕاینەسپاردمایە، ئەمزانی ئێستا چیم پێ ئەوتی!!!! بەس... تەحەمول باشترە.

Cut

دیمەنی – ٢٣٤ – ڕ / ن - ژووری عەمید سەرکۆ:

(( عەمید سەرکۆ لە جێگەی خۆی دانیشتووە، نەقیب ڕاهۆز لەسەر قەنەفەیەک بەرامبەری نارەوەن))

نارەوەن: بەڵێ ماکیاژەکانیشی نەداونەتێ و بردوویەتیەوە بۆ کۆمپانیاکەی خۆی، ئیتر چۆن قەناعەتی پێکردوون لێیان وەربگرێتەوە؟ ئەوەیان نازانم.

سەرکۆ: ئەم زانیارییانە زۆر باشن دەستخۆش، بەڵام ببورە مەبەستی تۆ لە گەیاندنی چییە؟

نارەوەن: وەڵا باوکم هەقی خۆتە پرسیاری وام لێ بکەی.. یەعنی هەرکەس شتێکی گوماناویی بینی و بە دەزگاکانی دەوڵەتی بڵێ، گومانی لێ ئەکەن؟ وەڵا باوکم دەستتان خۆش بێ.

سەرکۆ: نا تکایە بە هەڵە لە پرسیارەکەم تێنەگەی؟ ئەبێ ئێمە زۆر بە وردیی لێکۆڵینەوە بکەین لە هەموو شتێک.. ئەم بابەتەش دۆسیەی بۆ ئەکرێتەوەو ئەو نەقیب ڕاهۆزەی بەردەمت ئەکەین بە لێپرسراوی دۆسیەکەو جەنابیشت تەنها سەرچاوەمان ئەبیت.. ئەبێ هەموو شتێک لەبارەی سەرچاوەکەمانەوە بزانین.

نارەوەن (( لەم کاتەدا ڕاهۆز قسەکانی ئەنوسێتەوە)): بۆ ئەوەی کۆمەڵگە تێکنەچێ، هەرچی شتێکی خراپ ڕوودەدا هەر لە سەرەتاوە ڕێی لێ بگیرێ باشترە، ئێوەش یەکەمین کەسن ئەو دەسەڵاتەتان هەبێت، خۆ شاری بێ حاکم نییە، هەر ڕێشارێکمان لێ پەیابێ و بۆ خۆی حوکمڕانیی بکا.. ئەوە مەبەستەکەمە.

سەرکۆ: زۆر باشە، تۆ ئەو حەماڵە وەک سەرچاوە بەکار بهێنەو لەگەڵ نەقیب ڕاهۆز ڕێک بکەون، زانیارییەکان بدەی بەو.

ڕاهۆز: من لە ژوورەکەی خۆم ژمارەی خۆمت ئەدەمێ و ڕێنماییت ئەکەم چی بکەیت و چی نەکەی.

(( حواری ترو چوونە دەرەوەی ڕاهۆزو نارەوەن لە میوتیدا )) ______ Cut ______

دیمەنی – ٢٣٥ – ڕ / ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن خەریکی سفرە ڕازاندنەوەیە لەسەر مێز، زوبێرو دارەوان و بروسک و ڕێژوان دێنەوە، دوای سڵاو لە چیمەن و بەخێرهاتنەوەو سوپاس کردن بۆ دەعوەتەکەو هەواڵپرسینی ژن و ماڵ و مناڵی دارەوان))

ڕێژوان: باوکە ئەم دەعوەتەم زۆر پێخۆش بوو، تا بە ئامادەبوونی کاک دارەوانیش قسەی خۆم بکەم.

بروسک: زۆر کورتی بکەیتەوە باشترە، چونکە هەموومان ئەزانین. ها ها ها

ڕێژوان: چی ئەزانن بەقوربان؟ خۆ خۆم جارێ هیچ نازانم. هههە

زوبێر: ئێمە هیچ نازانین، فەرموو قسەکەت بکە پێش ئەوەی دەست بکەین بە نانخواردن، ئەگینا دوایی ناتوانین ورد گوێت لێ بگرین هههە

ڕێژوان: زۆر باشە.. ئەمەوێ داوای ژنم بۆ بکەن.

چیمەن: واو چەند هەواڵێکی خۆشە، کورە وەی بەسەرچاو، لە ڕێوە ئەبێ خۆم بچم. ئەی ئەو خۆشبەختە کێیە؟

دارەوان: با تۆزێک تەعزێکە کۆن بێ ڕێژوان.. جارێ زوو نییە؟

ڕێژوان (( خۆ عاجز کردنی سوعبەت)): ئێوە ئەمە چووزانن؟

بروسک: باش بوو زۆر کورتت کردەوە هههە.

زوبێر: مانگێکیتر هەموو شتێک ئەبڕینەوە، بەسەرچاو، ماڵێکی باشن.

دارەوان: بەس حەیف براکەی لای ئەو شەللاتییە دەوام ئەکا، خۆی و ژنیشی.

ڕێژوان: جا ئەم چی بکا؟ خۆ پێشتریش لای خۆمان بوو.

(( دایالۆگ و پێکەنین و نان و چێشت هێنان))

Cut

دیمەنی – ٢٣٦ – ڕ/ن – ماڵی حەمەخدر:

(( ماڵەکە قەنەفەیەک و سیسەمێک و هەندێ گوڵی سروشتی لە گوڵدانێک و دوو کورسیی باش و تەپڵەکێکی زیاد کردووە.. خدر جلی حەماڵییەکەی داکەندووەو ڕانک و چۆغەی لەبەردایە.دانیشتووە، چاوەڕوانە، چای ئامادە کردووە.. لە دەرگا ئەدرێت، بە پەلە ئەچێ ئەیکاتەوەو لەگەڵ نارەوەن دێنە ژوورەوە))

نارەوەن: ئۆو ئۆو وەڵا بابە ئافەرین.. کردت بە ژووری گەنجان.. ئیتر لە ژووری کوڕی زوگورتی ناچێ.. دەی دەی جلوبەرگی تازەشت کڕیوە.

خدر: بەڕاست پێم بڵێ چیت بەدڵ نییە؟

نارەوەن: زەوقێکی جوانت هەیە، هەمووی نایابە، جلەکانت نەبێ. هەهە

خدر: چییەتی؟

نارەوەن: من ئەمەوێ لە شوێنێک داتبمەزرێنم، بە جلی ڕەسمییەوە دەوام بکەی، نەک جلی کوردی.

خدر: ئێمە بڕیارماندا پێکەوە دوکانێک دابنێین، بۆ دوکانیش هەموو جلێک ئەبێت.

نارەوەن: ڕاستە، کە وابێ هەر هەمووی پیرۆزە.. چەندی تێچوو؟

خدر: زۆرنا، هەر هەمووی بە جلەکانیشەوە ٣٠٠ دۆلار.

نارەوەن: پیرۆزە، بە بۆنەی ئەوەوە کە دەعوەتت کردم بۆ بینینی، ئەو ٣٠٠ دۆلارە دیارییە لە منەوە بۆ تۆ.

خدر: قەت شتی وا نابێ.

نارەوەن: دیاری ڕەتناکرێتەوە کوڕی باش، چۆن وا ئەڵێی؟ گریمان بۆ کوڕەکانی خۆمم کڕیوە، تۆش هیچ جیاوازییەکت نییە لەگەڵ ئەوانا.

خدر: هیچ فەرقی نییە، بەڵام تۆش ناخۆشت کرد.. ئەمەوێ خۆم شتێ بکەم، دڵی تۆش خۆش بکاو خۆم ڕەنجم بۆ دابێ.

نارەوەن: ئەوەش ئەکرێ، ئەوەی من ئەتدەمێ، بیدە بە مێزتەوالێت و کەنتۆرێک و دەستێ کراس و پانتۆڵیش بکە لە حسابی خۆت هههههه.

خدر: باشە بۆ ئەوەش بانگت ئەکەم ئیتر بزانم چیم ئەمێنێ ببێتە ماڵێکی باش.

نارەوەن: هەر ژنەکەی نوقسان ئەبێ، ئەویش پەلە مەکە تا دوکانەکە دائەنێین، با بە تێروتەسەلیی بێت و هەموو ژوورەکانی تریش پڕ بکەیتەوە.. تۆ هەر ئەم ژوورەت پڕ کردۆتەوە.

خدر: کێشەم نییەو هەر ژنیش ناهێنم، ئاوا زۆر بێ کێشەو ئیسراحەتم، زۆر لە ئێستای ژیانی خۆم ڕازیم.. گەر هەر ئاوا بۆم بلوێ، پاشام پاشا.

نارەوەن: ئەی بۆ ئیشەکە چیت کرد؟

خدر: زۆر بە وریایی خەریکم، ڕەنگە هەفتەی داهاتوو هەواڵی سەیر سەیرت بدەمێ.

نارەوەن: چۆن؟

خدر: تا زۆر دڵنیا نەبم هیچت پێ ناڵێم.. دەی ئێستا کاتی چا خواردنەوەیە، حازرم کردووە..

نارەوەن: ئای خوایە لە خدر!! باشە، ئەوەندە بزانە بەسەر ئاگرەوەم بۆ هەر هەواڵێک.

خدر: ئەوە ئاسانە نارە خان گیان. تۆ خدرت هەیە، ئیتر خەمی چیت هەبێ؟

نارەوەن: خوا خدرم بۆ بهێڵێ.. بە قوربانت بم.

خدر: کچێ هەر خۆم قوربانیشت.. تۆ منت کرد بە پیاو، ئێستا شانازیی بە خۆمەوە ئەکەم.

نارەوەن: خوا نەکا خدر گیان، پێشتریش خۆت هەر پیاویت هههههه.

(( لە میوتیدا دایالۆگ و پێکەنین و چا تێکردن و خواردنەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٣٧ – ڕ/ د – سەرشەقامێک:

(( ڕۆستەم و سالم لەسەر شەقامێک وەستاون، ڕۆستەم تەلەفون ئەکا ))

ڕۆستەم: هەر وەڵام ناداتەوە.

سالم: خدر ئەگەر لەژێر باریشدا بووبێت، ئەگەر تەلەفونی بۆ بکرێ و نەتوانێ وەڵام بداتەوە، هەر کە بارەکەی داگرت، خۆی ئەیکاتەوە، وازی لێ بێنە. دیارە ئیشی هەیە.

ڕۆستەم: هەر ئەمجارە بۆی ئەکەمەوە.

سالم: وازی لێ بێنە، هەرکاتێ کردیەوە پێی بڵێ شەو بێت بۆ نادیی و بڕایەوە.

ڕۆستەم: دەی باشە.. لە بازاڕ نەبوو، ڕەنگە لەماڵەوە بێ، ئەی بۆ هەر نەچین بۆ ئەوێ و قسەی لەگەڵ بکەین، خۆ ئەو ناخواتەوە، ئیتر بۆ بێت بۆ نادی؟

سالم: دەی بابچین سەرێکی ماڵەکەی بدەین، هەنگاوێکە.

(( ئەکەونەڕێ ))

Cut

دیمەنی – ٢٣٨ – ڕ/ن - ماڵی هەندرێن:

(( سەلوا سەعی بە باڵا ئەکاو تەواو ئەبن.. لە دیمەنەکەدا سەلواو تافان و باڵا هەن))

باڵا: ئەوە سەعیم تەواو کرد، بەخوا باوکم هەرچییەک بۆ کڵپە بکڕێ، ئەبێ بۆ منیشی بکڕێ.

سەلوا: ئێ ئەیکڕێ چاوەکەم، بەس تۆ خەوتبووی بۆیە نەیبردی.

تافان: کە هاتەوە پێی ئەڵێم تۆش ببا.

باڵا: تۆش ببا چییە؟ بەخوا هەر ئەبێ بمبا ئەگینا ئەم گەڕەکە ئەهێنمە سەرتان.

سەلوا (( پێکەنین)): وەڵا هەر لەوەمان کەم بوو هەهە.

تافان: باڵا ئاقڵبە کە وتم ئەتبا یەعنی ئەتبا (( بۆ سەلوا)) ئینجا پورە سەلوا گۆرانیی وا خۆش خۆش ئەزانێ، هەموو ڕۆژێک لە مەکتەب گۆرانیی پێ ئەڵێن.

سەلوا: هەی ئافەرین.. ئادەی بزانم.. گۆرانییەکم بۆ بڵێ.

باڵا: ئاخر بڵێ بەڵێن بێ باوکت ئەتبا.

سەلوا: بەڵێن بێ سەد بەڵێن. (( سەلوا زەنگێکی بۆ دێت، دائەخاتەوە))

باڵا (( هەڵئەسێ ماچی ئەکا)): گۆرانی عەرەبیت بۆ بڵێم؟

سەلوا: ئۆو عەرەبی؟

تافان: ئا ئا ئەیزانێ، ئادەی باڵا گۆرانیی کابرا سمێڵ فشەکەی بۆ بڵێ.

(( باڵا گۆرانیی یەبە یەبەی بۆ ئەڵێت و دواتر سەلوا ماچی ئەکاو لە میوتیدا حواری کەم))

Cut

دیمەنی – ٢٣٩ – ڕ/ د - بەردەرگای ماڵی خدر:

(( دەرگا ئەکرێتەوەو نارەوەن دێتە دەرەوە))

نارەوەن: بۆ کوێ دێیت کورە مەیە دەرەوە.

خدر ((لەودیو دەرگاوەدەنگی دێت)): نا.. نا چۆن ئەبێ نارەخان گیان، گەورەت کردم.

نارەوەن: دەی خوا حافیز بەساقە (( خۆی دەرگاکە دائەخات و ئەڕوات.. ئەو دیار نامێنێ و ڕۆستەم و سالم ئەگەنە بەردەرگاو لە دەرگا ئەدەن و خدر دەرگا ئەکاتەوەو سڵاو))

تابع ——————— Cut ———————

دیمەنی – ٢٤٠ – ڕ/ن – ماڵی خدر:

(( ڕۆستەم و سالم دێنە ژوورەوە.. دوو پیاڵە ئەبینن چای تیا خوراوەتەوەو چاوێک بە ژوورەکەدا ئەخشێنن))

سالم: دیارە بە نیازی گۆبەن بنێیتەوەو ژن بێنی خدر؟!

خدر: کورە نە بەزاتی خوا.

سالم: کورە لە دەستێ نوێن زیاتر لە ژوورەکەدا نەبوو، بەخوا بۆ ئافرەت نەبێ ئاوا شتی بۆ ناکرێ.

خدر: مەسەلە ئافرەت نییە، پیاو دۆست و دوژمنیشی هەیە، با کە یەکێ دێتە ماڵەکەی شتێک ببینێ، نەک ژووری بەتاڵ.

ڕۆستەم: ئەی ئەو میوانەت کێ بوو لێرە؟

خدر (( شڵەژان)): بینیتان؟

ڕۆستەم نەوەڵا نەمانبینی، بەس ئەوە دوو پیاڵەیەو چاشی تیا خوراوەتەوە.

خدر: خۆزگە بتانبینیایە، کوڕێکی برادەرم بوو ئەڵێ لای خۆت بمکە بە حەماڵ، جا ئەوەندە ناشرینە باوەڕ ناکەم کەس بانگیکا هههههه

ڕۆستەم: دەی بە کورتی بۆ ئەوە هاتین پێت بڵێین ئەو پارەیەی وەرتگرت نۆشت بێ و کەس داوای ناکاتەوە.

خدر: ئەی باقییەکەی؟

سالم: ئێ خۆ کچەکەمان نەکوشت!

خدر: چۆن؟ ئەی من ڕێگەم بۆ دانەنان؟

خۆ پارەی ئەوەشمان لێ ناسێنیت؟ هههه

خدر: ئاییییی!!! ئەی چۆن کاک زوبێر داوای پارەکەی ناکاتەوە؟

سالم: وتی گەردنتان ئازا بێ، ئەوە بۆ پێشەکیی ئیشێکیتر گەر پێویستم پێی بوو.

خدر: دەی خۆ منیش ئەم ناومالّەم لەو پارەیە کڕی، تۆقیم وامزانی داوای ئەکاتەوە.

ڕۆستەم: نەوەڵا هەر زۆر شادمان بوو کە نەکوژرا، وتی من بە هەڵە ناوی ئەوم پێدابوون.

خدر: ئای خوایە، ئاخر بە هەڵە خەڵک ئەکوژرێ؟.. دەی ئیتر هەرچییەک بێ، بۆ ئێمە خێری تیا بوو، خوا نەیبڕێ.

ڕۆستەم: هەر بۆ ئەوە هاتین، ئەگەر دێیتە دەرەوە بابڕۆین.

خدر: نا بابە با کەس پێکەوە نەمانبینێ، خۆ منیش لەسەر چوونە دەرەوە بووم، وا خۆم ئەگۆڕی، ئێوە بڕۆن، منیش دوای ئێوە دەرئەچم.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی ڕۆستەم و سالم.. خدریش بەدەم خۆگۆڕینەوە گۆرانیی ئەڵێ))

Cut

دیمەنی – ٢٤١ – ڕ- عەسر/ د – بەردەرکی زانکۆ:

Mute

(( تیرۆژ لە زانکۆ دێتە دەرەوە هاوڕێیەکی لەگەڵدایەو دوای کەمێک لێی جیا ئەبێتەوە.. تایەر کە سەیارەکەی دوور ڕاگرتووە، دێتە دەرەوەو بەرەو لای تیرۆژ ئەچێ، ئاوا بە پەلە لە سەیارەکەی دائەبەزێت و بەرەو تیرۆژ ڕائەکا.. دوای کەمێک ئەبێ بە شەڕیان.. سەرەو مالەش کە سەیارەیان لەوناوەیە، بە سەیارەکەوە ئەچنە بەردەمیان و بە هەردووکیان لە تایەر ئەدەن و ئەیخەنە سەیارەی خۆیانەوەو دەرئەچن، ئاوا پێی سەیر ئەبێ و لەگەڵ تیرۆژدا بەرەو سەیارەکەی خۆیان ئەچن و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٢٤٢ – ش/ن – نادی:

(( بروسک و ڕێژوان و هەندرێن لەسەر خواردنەوەن))

هەندرێن: بەخوا گەورەم "مەبەستی زوبێرە" فەزڵی زۆرە بەسەر منەوە، قەت حەزم نەئەکرد جێی بهێڵم، تا ئەو بە من ڕازیبووایە خزمەتیم ئەکرد.

ڕێژوان: کێشە نییە کاکە هەندرێن، تۆ ئازیزی ئێمەیت، هەرکاتێ توانیتان دەستبەرداری ئەو هەتیوە بن و دەستی لێتان بووەوە، کۆمپانیای خۆتانە، بە هیچ لایەکا مەچن.

هەندرێن: یاخوا ماڵتان ئاوابێ، تۆش کوڕی ئەو پیاوە گەورەیەیت.

بروسک: وەڵا من وام پێ باشترە، تۆو ڕێژوان هەر نزیکتر ببنەوە لەیەک، (( ڕێژوان چاوی لێ بز ئەکاتەوە)) ڕەنگە باش بەیەکەوە بگونجێن.

هەندرێن(( پێکی بیرەکەی ئەخواتەوە)): جا چۆن نزیکبوونەوەیەک لەوە زیاتر؟ ئێمە هەر برا بووین هەرواش ئەمێنینەوە، ئێ بەخوا باڵاش مناڵە تا بیدەمێ هههههە

ڕێژوان ((پێکەنین بە احراجییەوەو لە بروسکەوە ئەژەنێ )): جا هەر برابووین زۆر ڕاستە.

بروسک: دەی خۆ گەر باڵا مناڵ بێ، گەورەش هەیە!!

هەندرێن (( کەمێک ڕامان)): جا ئەگەر ئەو بە خوشکی من ڕازی بێت کاکە بروسک، هەر قسەم نییە لە ئاستی ماڵی گەورەمدا. (( ڕێژوان چاوی زەق ئەکاتەوە لە بروسک))

بروسک: دەی کەواتە لەم شەوانەیا دێینە خزمەتتان.

هەندرێن: خزمەت لە ئێمەوە، سەر سەرو سەرچاو، یاخوا بەخێربێن.. کەواتە دەعوەتەکەتان بۆ ئەوە بوو؟ هههههە

بروسک: نا.. نا وای تێمەگە، ئەو باسە خۆی هاتە پێشەوە (( لەمیوتیدا حوارو پێکەنین)) ________________ Cut ________________

دیمەنی – ٢٤٣ – ش/ن –ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار دانیشتووەو کرمانج دێتە ژوورەوە ))

کرمانج: گەورەم ئەو هەتیوەمان بەردا کە سەرەو ماڵە هێنابوویان.

ڕێشار(( پێکەنین )): ئاخر تۆ بڵێ سەگباب ئێستا وەختی دڵداریی و حەز لێکردنە، لەم هەراو زەنایەیا؟ هههە لێدانی زۆریشی خوارد نەگبەتە.

کرمانج: قەینا شایانی بوو هههە بۆ حەز لە کچی خەڵک ئەکا؟

(( کرمانج دائەنیشێت و ڕێشار هەڵئەسێتە سەرپێ پشتی ئەکاتە کرمانج، پارەیەک لە قاصة دەرئەکات و ئەیخاتە زەرفێکەوەو ڕوو ئەکاتەوە کرمانج و ئەیداتێ ))

ڕێشار: ئەوە بگرە.

کرمانج (( وەریئەگرێت )): خێر گەورەم، ئەوە بۆچی؟

ڕێشار: بەشەکەی تۆیە لەو بارەی دوایی، کە کچەکانمان لەگەڵدا بوو.

کرمانج: خوا لە دەستی بەزیادکا گەورەم، خۆ منتان لەگەڵ نەبووم.

ڕێشار: لەگەڵ بی و لەگەڵ نەبی، بەشی خۆت پارێزراوە.. تۆش لێرە بوویت و ئیش و کاری ئێرەت بەڕێوە بردووە.

کرمانج: زۆر سوپاس گەورەم (( پارەکە هەڵئەگرێت )).

ڕێشار: ئەو هەتیوەش بێ ئەدەبی زۆری بەرامبەر کردم، سبەی بە ڕەحمانم وتووە چارەسەریکا.. هەندرێن.

کرمانج: هەر زۆر هیچ و پووچە گەورەم، ئەڵێی سێبەرە بەدوای ژنەکەیەوە، کەس ژنی نەبوو ئەو نەبێ؟!!!

ڕێشار: لە دوو سبەیەوە دارێک ئەدەم بە ڕوحیا بیری ژن و مناڵیشی نەمێنێ.

کرمانج: یاخوا دەستت خۆش بێ، هەر لە بەرچاویشمان نەمێنێ باشە.

ڕێشار: خەمت نەبێ، ئیتر قەت نایبینیتەوە.. بە ڕەحمانم وتووە، لەگەڵیا بچێ بۆ مەرزو بڵێ بارمان هەیە، لەوێوە یەک دوو تەلەفونی بۆ ئەکرێ، کە بارەکە لەودیو گیراوە.. پێم وتووە هەرچییەکت کردووە، وابکە ٢٠٠ گرامێک تلیاکی بۆ بخەرە ناو شتومەکەکەیەوە .. یەکێکیشم ڕاسپاردووە هەواڵ بدا بە یەکەم سەیتەرە.. هەرچەند حاشای لێ بکا سوودی نابێ و ئیتر خوای لەگەڵ هههە.

کرمانج (( بە خۆشحاڵییەوە گوێی گرتووە)): ئەک دەستخۆش گەورەم، بەخوا ئیش هەر لە خۆت جوانە.. ئەی ڕەحمان چۆن ئەو تلیاکەی دەست ئەکەوێ، بەخوا ئێستا بە من بڵێی هەر بۆم پەیا ناکرێ.

ڕێشار: ئەوەیان ئاسانە، ماوەیەکیتر خۆم پێت ئەڵێم چۆن پەیا ئەکرێ.

کرمانج (( ئەترسێ)): ئەی مەترسیدار نییە گەورەم؟

ڕێشار (( بە خەندەوە)): کورە ئیش بە مەترسییەوە خۆشە.. ئەگەر سەدساڵ ئیشی بێ مەترسیی بکەی هیچ پێکەوە نانێی کرمانج، خەیاڵ پڵاو مەبە.

کرمانج: ئاخر کە گیراشین، ئاوەو ئاو تیا ئەچین.

ڕێشار: جا یەکێ ئەوەندە غەشیم بێ بگیرێ، خۆی بۆ لە ئیشی مەترسیدار ئەدات؟

کرمانج: بەخوا من لەوە غەشیمترم کە تۆ باسی ئەکەی گەورەم.

ڕێشار: خۆم ڕێ و جێی وات بۆ دائەنێم، زۆر سەردەرکردوو بیت.. بە جارێکیش بۆ خۆت ئەتەقی.. ئەی ئەوە وەزعە تۆی تیای؟ خانوەکەت لە دەرەوەی شارو ١٠٠ مەتریشە؟ تۆ ئەزانی لە چ وەزعێکدای؟ بەخوا بەزەییم پیاتا دێتەوە.

کرمانج: ئەی ئەگەر ئەوەم کرد.

ڕێشار: هەر بە یەکەم کاروان، ڤێللایەک ئەکڕی و سەیارە شڕەکەشت ئەبەخشی بەو لەبرسا مردووانە.

کرمانج: بەخوا تەماعت خستمە بەرگەورەم.. جا بۆ نا؟ ئەی من چیم لەو خەڵکە کەمترە؟

ڕێشار: تەنها غیرەتت کەمترە.. کە غیرەت و بوێریت پەیا کرد، ئەوسا تۆش یەکێک ئەبی وەک ئەوان.

Cut

دیمەنی – ٢٤٤ – ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( دارەوان و ئامۆو ئاوا دانیشتوون و نارەوەن لە پشتی دەرگاکەوە گوێیان لی ئەگرێ))

دارەوان: نەتزانی ئەوانەی ڕفاندیان کێ بوون؟

ئاوا: نا، قەت نەمبینیون، زۆریان لێداو خستیانە سەیارەکەی خۆیانەوە.

ئامۆ: هەر پۆلیس ئەتوانێ شتی وا بکا.. لەوان زیاتر نییە.

دارەوان: خۆ ڕەنگە وابێ.. یان ئەو دۆستانە بن کە تریفەیان ڕزگار کردو وا تیرۆژیشیان پاراست.. تیرۆژ ئەڵێ کابرایەکە زۆر ڕۆژ دوام کەوتووەو حەزی لێکردووم، بەڵام من بە هیچ شێوەیەک ڕووم نەداوەتێ و ئەسڵەن هەر جوابیشم نەداوەتەوە.

ئاوا: ڕاست ئەکا، کابرا خۆیشی وتی من حەزم لێکردووە، نەیوت کەپڵی خۆمە هههە.

دارەوان: خوا ئەزانێ ئێستا چییان بەسەرهێناوە؟!

نارەوەن (( دێتە ژوورەوە)): گوێم لە هەموو شتێک بوو.. کەواتە بەڕاست ژیانی ئێمە کەوتۆتە مەترسییەوە، باشە بۆ ئێمە؟ ئێوە شتێکتان کردووە، کەسانێک پێیان ناخۆش بێ و کەسانێکیش بمانپارێزن؟

دارەوان: گەورەی مەکەرەوە کچێ، ئەوە چییە هەتیوێک دوای کچەکە کەوتبێ؟ کچەکە جوانەو بەخوا ڕەنگە زۆریتریش داوای پەیوەندییان لێکردبێ.

نارەوەن: حەددی چییە؟ تا زانکۆ تەواو نەکا.

ئاوا: خۆی زۆر باشەو ئەو شتانەی نییە، تورەی مەکە نەک لە ڕقی قسەکەی تۆ، سبەی بە یەکێک ڕازی بێت.

(( هەندێ دیالۆگیترو تورەبوونی نارەوەن، جاروبار پێکەنینی دارەوان))

Cut

دیمەنی – ٢٤٥ – ڕ/ د – سەر شەقام:

(( تافان و هەندرێن بەڕێدا ئەڕۆن، هەندرێن جانتایەکی پێیە.. ڕووبەڕووی خدر ئەچن))

خدر: ئەوە خێر کاک هەندرێن؟

هەندرێن: وەڵا حەمەخدر گیان ئەچم بۆ سەر مەرز، کاک ڕێشار بارێکی هەیە وەریئەگرم و ئەیهێنمەوە.

خدر: ئەی ئێمەی تیا نیین؟ یان هەر کچەکان ئەبەی؟

هەندرێن: نا نەوەڵا، هەر خۆم و ڕەحمانی خزمەتکار ئەچین، ڕەنگە بۆ ئێوارە بگەڕێینەوە.

خدر: دەی سەفەری سەلامەتیی بێ.

(( دوای خواحافیزیی.. هەندرێن و تافان بەرەو کۆمپانیا ئەچن))

Cut

دیمەنی – ٢٤٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو دارەوان دانیشتوون))

دارەوان: زۆر سوپاس بۆ هەموو شتێک زوبێر گیان، تریفە جیبێکی کڕیوە، دڵی زۆر پێی خۆشە.

زوبێر: عەیبە ئێمە براین، ئەوە چییە باسی ئەکەیت؟ پیرۆزی بێت.

دارەوان: ئەڵێم وا بزانم ئاسایی بۆتەوە بچێتەوە قاوەخانەکەی؟

زوبێر: بە قسەی منت بکردایە، هەر یەکەم ڕۆژ بچووایەتەوە باشتر بوو، هەم مێردەکەی و هەم کرێکارەکان ئاگاداری بوونایە بەسی بوو..

دارەوان: وائەکەم، کە نیوەڕۆ پێکەوە چووینەوە پێی ئەڵێم بڕواتەوە.

زوبێر: نا ئەرک مەکێشن.

دارەوەن: بە نارەوەنم وتووە ئامادە بن.. ئەرک نییە، ئەرکی چی؟

Cut

دیمەنی – ٢٤٧ – ڕ/ د- بەردەرگای ماڵی دارەوان:
(( نارەوەن لە سەیارە دائەبەزێت و مۆبایلی بەدەستەوەیە))
نارەوەن: ١- خدر گیان وەک وتم ئەبێ ئەوە بدۆزیتەوە، کاتی زۆری بەسەردا تێپەڕی بەساقە، ئەوە دوێنێ بەزمێکیتریش ڕوویداوە دوایی ئەتبینم بۆت باس ئەکەم، ئەگەر ئەوانە نەدۆزینەوە، ژیانمان ئەکەوێتە مەترسییەوە ..... ٢- وەی قوربانت بم، ئەو فریشتەیەم بۆ بدۆزەرەوە، کە کچەکەمی ڕزگار کرد.. ئینجا بزانە دیاری ئەمجارەت چۆن ئەبێ .... ٣- بە دڵی خۆت، هەر لە دووریشەوە پێم نیشان بدەی ممنون ئەبم..... ٤- کورە دەبڕۆ ترسنۆک، جا تۆ هەروا ترسنۆک نەبوویت، مەترسیداری چی؟ وەڵا حەز ئەکەی لە بازاڕا پیاسەی لەگەڵ ئەکەم، با هەموو دنیا بمبینێ.. ڕۆڵە ئەوە فریشتەیە، چۆن خەڵک لە فریشتە ئەترسێ، تۆی ترسنۆک نەبێ ........٥- خەمی شتت نەبێ، هیچیش پەیا نەکەی من لە خزمەتدام، ناهێڵم لە کورتیی بەیت..... ٦- باشە بەساقە، هەرچیت دەسکەوت لای ئێوارە تێل بکە، دارەوان و زوبێرو هەموویان دێنەوە نیوەڕۆ لێرەن، ماسیی برژاوم بۆ کڕیون.. بزانە تۆش خۆتیان پیا هەڵناواسی، حەز ئەکەم تۆش لێی بخۆی..... ٧- وەی بەسەرهەردوو چاوم، هەر تۆو ماسیی؟...... ٨- بەسەرچاو، لە ماڵەوە خۆشترە شتی تریشی لەگەڵا ئەهێنم و پێکیشەوە ئەیخۆین...... **(( لەم کاتەدا سەیارەیەک دێت و دوو کەسی تیایە، دیقەتیان نییە، بەڵام نارەوەن دیقەتیان ئەداو گێلاسیش دێتە دەرەوە))** ٩- باشە گیان، خوا ئاگادارت بێ، هەڵە نەکەی... ١٠- خواحافیزت بێ بەقوربان.

دیمەنی – ٢٤٨ – ڕ/ د – سەر شەقام:
(( خدر تێل لەگەڵ نارەوەن ئەکا)): ١- نارە خان گیان، ئەوە هەروا ئاسان نییە چاوەکەم، با پێت بڵێم بەڕاستی هیچ گومانم لەسەر ڕێشار نەماوە.. من لەو بڕوایەدام، کەسێکیتر بێت.. بەڵام زۆر نزیکم لەوەی بگەمە کابراکەی تریفەی ڕزگار کرد، خەریکە بیدۆزمەوە، ئەوسا ئەو یارمەتی زیاترمان ئەدا...... ٢- نا نا دیاری چی؟ من بۆ تۆی ئەکەم، ئەیهێنم بۆ ماڵتان، بەس خۆم ناوێرم لەگەڵیا بێم، نەک پێکەوە بمانبینن....... ٣- نا، لەبەر خاتری تۆ ئەیهێنم بۆ ماڵیشتان.. سەرەداوێکی باشم دەستکەوتووە، ڕەنگە لەم ڕۆژانەدا بیگەمێ.. بەڵام نارەخان زۆر تایبەت و نهێنیی بێت، نە کاک دارەوان و نە منداڵ، کەسیان نەزانن، تەنها خۆت، بەخوا ئەوەش لەبەرخاتری تۆ، ئەگینا خۆت ئەزانی چەند مەترسیدارە..... ٤- بەخوا خۆت ئەزانی، من ترسنۆک نیم هههههە.. باشە گەورەم، با جارێ بچم بەلای ئیشمەوە، شتێ پەیاکەم........ ٥- زۆر سوپاس، جا هەروا نەبووە.. بەس با ون نەبم لەوناوە..... ٦- وەڵا من لەگەڵ ئەوان نایەم، کە کابرای ڕزگارکەرت بینی، با دیارییەکەی من ماسیی بێ لە چێشتخانەکە..... ٧- ئەرەوەڵا هەر زۆریشم حەز لێیەتی...... ٨- بەدڵی خۆت.. با من بڕۆم ئێستا..... ٩- نا هیچ خەمت نەبێ، خۆم ئەپارێزم........ ١٠- خواحافیز نارەخان.

گێلاس: نارەوەن خان ئەو سەیارەیەت بینی؟

نارەوەن: ئەرەوەڵا دوو سێ جاری تریشم بینیوە، دیارە تازە هاتوونەتە ئەم گەڕەکە.

گێلاس: کچێ دوو سێ جاری چی؟ ڕۆژیی دەجار زیاتریش دێن و ئەچن.

نارەوەن: ئەوە بەڕاستتە؟ (( دەست ئەبا شت دائەگرێ لە سەیارەکەی)) ئەی سەرنجی کوێ ئەدەن؟

گێلاس: وەڵا هیچ شوێنێک، هەر جرت و فرتیانەو هیچیتر.

نارەوەن: وەڵا سەیرە، هەست ناکەی بەدوای کەسێکەوە بن؟

گێلاس: نا نا، هیچ.

نارەوەن: بەخوا دیارە سەر بە حکومەتن!

گێلاس: خۆ ئەوەش ئەبێت.. ئەڵێی میوانت هەیە؟

نارەوەن: ئەرەوەڵا دارەوان برادەرانی کۆمپانیای بانگ کردووە، بەخوا تاقەتی هیچم نەبوو بیکەم، چووم ماسی برژاوی دەرەوەم بۆ هێنان.

گێلاس: کچێ وەڵا دەستت خۆش بێ، تەنیاباڵ چۆن ئەتوانی خواردنی ئەو هەمووە بکەیت و بەڕێیانکەی.. ئیشکەرێکیشت هەر نەهێنا.

نارەوەن: نا بەساقەوبم ئەوەیان نا، وا خۆم بەڕێی ئەکەم.

(( هەندێ کورتە حواریترو گێلاس ئەچێتە ژوورەوەو نارەوەنیش شت دائەگرێ))

Cut

دیمەنی – ٢٤٩ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆ دانیشتووەو ڕاهۆز هەندرێن ئەهێنێتە ژوورەوە))

هەندرێن: گەورەم بە چی سوێندت بۆ بخۆم، نازانم کێ ئەوەی بۆ خستوومەتە ناو جانتاکەمەوەو بەهیچ شێوەیەکیش خۆم ئاگاداری نیم.

سەرکۆ: تۆ بە فەرمانی دادوەر دەست دەستگیر کراوی، بۆ ماوەی ٤ ڕۆژو لەوانەیە تازەش بکرێتەوە، تا ئەچینە بنج و بنەوانی کەیسەکەت.. ڕاهۆز، لێکۆڵینەوەی تەواوی لەگەڵ بکە.. فەرموو!

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم.

هەندرێن(( پاڕانەوە)): وەڵاهی گەورەم بێتاوانم.

(( ڕاهۆز هەندرێن ئەباتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٥٠ - ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( منداڵەکان ئەگرین.. سەلواو تافان زۆر بێتاقەت))

تافان: باشە بۆ ناهێڵن بیبینین؟

سەلوا: جارێ لە لێکۆڵینەوەدان، من دڵنیام ئەمە هەڵبەستراوەو کەسێک ئەمەی کردووە.

تافان: من دڵنیام ئەمەش هەر دەستی ڕێشارە.. ئەها لەم شەوانەدا چۆن هەندرێن پۆرتی شکاند؟ ئەوە تۆڵەی خۆی بەمە کردەوە.

سەلوا: با پەلە نەکەین، سبەی دوو سبەی هەموو شتێک ڕوون ئەبێتەوە.

تافان: جا تا سبەی دوو سبەی دێت، خۆ من دڵم ئەتەقێ.

سەلوا: دەی چی بکەین؟ دەسەڵاتی ئەم گورگانەمان نییە.

تافان: ئۆۆۆۆۆهـ خوا هەرکەس هەندرێنی بەو دەردە برد فەوتیکەی.

سەلوا: ئامین. (( زەنگی بۆ دێت)) بەڵێ.

ڕێژوان (( دەنگ)): نەتانبینی؟

سەلوا: ناهێڵن.

ڕێژوان: باوکم وتی نەهێڵی پێویستیان بە هیچ شتێک هەبێ.. تێ ئەگەی؟

سەلوا: زۆر سوپاس، خوا باوکت بۆ هەموو لایەک بهێڵێ.. جارێ باشین، هیچ خەمتان نەبێ.

ڕێژوان: دەی یاخوا هەر باش بن.. بیرت ئەکەم کەی بتبینم.

سەلوا: ئەلو.. ئەلو.. ئەلو.

ڕێژوان: گوێم لە دەنگتە، ئەو ئەلو ئەلوەت لە چییە؟

سەلوا: دیارە شەبەکەی نەما. (( مۆبایلەکە دائەخاتەوە ))

تافان: خوشکێ گیان ئەوە لە ئێمەوە بۆ ئێوە ماوەتەوە، ئای، لە یەک ساڵە وایە دوو ساڵە هیچ نازانێ.. بچۆ لەودیو تەلەفونەکەت تەواوکە.

سەلوا (( زەنگیتری بۆ دێت )): دەی باشە بە یارمەتی.

بالاّ: دایکە باوکم بەرئەبێ؟

تافان: ئەی چۆن؟ تۆ وا بزانە دیسان چووە بۆ ئیش خەفەت مەخۆ کچم.

کلّپە: کەی بەر ئەبێ؟ خۆ تۆ هەر نەتبینیوە، ئیتر بۆ لە خۆتەوە قسە ئەکەی؟

(( هەندێ وردە دیالۆگ و تافان باوەشیان پیا ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ٢٥١ – ش/ د – سەر شەقامێک، نزیک لە دوکانی ئاواو ئامۆ:

(( محە ناشوکر، لەسەر شۆستەیەک بە سیپاڵێکی ڕوتەوە ڕاکشاوەو ڕەق بۆتەوە.. ئەردەڵان بەوێدا تێپەڕ ئەبێت))

ئەردەڵان: کورە خەڵکینە فریاکەون، وەرن محە ناشوکر ڕەق بووەتەوە.

(( خەك دێن و لە ناویاندا هاوڕێ و خدرو ئاواو ئامۆ ئەبینرێن، .. دەستی ئەدەنێ و هەڵیئەگرن و ئەیخەنە سەیارەیەکەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٥٢ – ش/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆزو هەندرێن))

سەرکۆ: کارێکی وامان بۆ کردووی بە کەفالەت ئازاد بکرێی، ئەبێ ڕێزی ئەو هەوڵەی ئێمە بگریت.

هەندرێن: ئێوە ئەمر ئەفەرموون قوربان گیان.. باوەڕت بێ گەورەم، زۆر بێتاوانم.

سەرکۆ: بەدوای بەڵگەی بێتاوانیتا بگەڕێ، ڕەنگە دەستت بکەوێت و ئەوکاتە بە یەکجاریی لە زیندان و لە دادگاکان ڕزگار ئەبی.. ئیتر ئەوەش ئەکەوێتەوە سەر زیرەکیی خۆت.

هەندرێن: هەوڵی زۆر ئەدەم گەورەم.

ڕاهۆز: ئەبێ وا بکا گەورەم، ئەگینا بەلانی کەمەوە سێ ساڵێک بەند ئەکرێ.

سەرکۆ: ئیتر با بتبینین.

هەندرێن: لە خزمەتتانام گەورەم.

سەرکۆ: دەبڕۆ ئاگات لە خۆت بێ، جارێکیتر وریاتر بە.

ڕاهۆز: هیچت بیر نەچێ لەوەی پێم وتووی.

هەندرێن: بەسەرچاو گەورەم.. هیچم بیر ناچێ.. خواحافیز، زۆر سوپاس.

(( هەندرێن ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٥٣ – ش/ د – نزیک دەرگایماڵێکی کۆن:

(( ڕۆستەم و زوبێرو سالم سەرخۆشە، نزیکی دەرگاکە وەستاون))

زوبێر: بیستوومە کرمانج دەستە ڕاستی ڕێشارەو هەرچییەک ئەکا لە ڕێگەی ئەوەوە ئەکرێت.

سالم: کرمانج چییە؟ نازانم.

زوبێر: جا گەوجە تۆ چی ئەزانی؟ نەخشەدارێژەرو جێبەجێکەری ڕێشارە.

سالم: بۆ نا؟ هەموو شتێک ڕێی تێ ئەچێ.

زوبێر: جا گەر ئەو کرمانجە لەناوبەرین، کە زۆر ئاسانترە لە ڕێشار، ئەوا ڕێشار بە یەکجاریی پەکی ئەکەوێت.

ڕۆستەم: هەرچییەک فەرمانی تۆ بێ گەورەم، بەجێیە. بەڵام بەخوا ڕێشار زۆر زەحمەتە.

زوبێر (( بۆ ڕۆستەم)): ئەمجارەیان، بە هیچ شتێک نەخەڵەتیی، جاری پێشوو خێری پێوە بوو.. بەڵام ئەمجارە ئەبێ بیپێکی.

ڕۆستەم: باوەڕت بێ جاری پێشووش ئەو سەگبابەمان لێ پەیا نەبووایە، ئێستا هەموو شتێ تەواو ببوو، بەڵام وەک جەنابت فەرمووت، خێری پێوە بوو.

زوبێر: دەی بە هەردووکتان تۆو سالم چاودێریی باشی بکەن و ئیتر ناتانبینمەوە تا ڕۆژی پرسەکەی، باقیی پارەکەتان بۆ ئەهێنم.

سالم: بەسەرچاو، بێخەمبە.

(( هەندێک حوارو زوبێر ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٢٥٤ – ڕ/ ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( خدر دێتە ژوورەوە))

ڕێشار: ها حەمە خدر؟

خدر: دەستت ماچ ئەکەم گەورەم، کاک فریاد پێی وتم ئەو مەخزەنەی بۆ چۆڵکەم، منیش هاتم بە جەنابت بڵێم.

ڕێشار: ئا ئا، تەلەفونی بۆ خۆشم کرد، لۆرییەکی گەورە زەیتی بۆ دێت، دوو ڕۆژ ئەیخاتە مەخزەنەکەی ئێمەوە، باشە بۆی داگرن.

خدر: ئاخر کارتۆنە ئاوی تیا ماوە گەورەم.

ڕێشار: کێشە نییە، تەلەفونیان بۆ ئەکەم لای نیوەڕۆ بێن بیبەن، ئەوسا ئەوەندەی لێ نامێنێ ڕێ بگرێ، باش.

خدر: من لە خزمەتدام گەورەم، نیوەڕۆ بۆی دائەگرم.

ڕێشار: دە باشە مێشکم مەبە، بڕۆ ئیتر.

خدر: باشە گەورەم بەسەرچاو.. خواحافیز.

(( ڕێشار جوابی ناداتەوەو خدر ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٢٥٥ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دارەوەن:

(( نارەوەن دارەوان بەڕێ ئەکاو مۆبایلەکەی پێیە، دەرگای گەراجی بۆ ئەکاتەوەو ئەویش سەیارە دەرئەکا ))

نارەوەن: نیوەڕۆ نایەیتەوە خواردن حازرکەم؟

دارەوان: کچێ هەر دوێنێ بوو، ئیتر کەی من نیوەڕوان هاتوومەتەوە؟

نارەوەن: ئێ چوزانم!! وتم نەک برادەریترت بێنیتەوە!

دارەوان: نا نا، مەگەر بۆ خۆتان شتێ بکەن؟!

نارەوەن (( جەرەسی بۆ دێت)):

# (( ئەڵقەی سیانزە))

نارەوەن: ئەلووووو!

دارەوان: دەی من ئەڕۆم، تۆ خەریکی تەلەفونی خۆت بە.

نارەوەن: باشە دارەوان گیان تۆ خواحافیزت بێ.. باشی ئاسکە خان......... سوپاست ئەکەم(( دارەوان ئەڕواو دوور ئەکەوێتەوە)) ئەک سەرە کەچەڵەکەت بە تاشینچێ باشە؟ خۆ دارەوانی لێبوو.. ئەوە ئێستا دەرچوو.......... چۆن؟؟؟؟؟؟ ............ زۆر زەرورە؟ ........... دەی مادام وایە، من سەعات ١٠ دێم بۆ ماڵی خۆت.......... ئەزانم بە کەڵکی قسە نایەت، بەس کە هاتم لە ماڵ بیت، با لەبەردەرگا زۆر نەوەستم......... باشە خوات لەگەڵ ماڵەکەم.

ئای خوایە، ئەبێ ئەمجارە چی بێت؟ بەوەی باشە شوێنی ماڵەکەی چەپەکە.

(( نارەوەن ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٥٦ – ڕ/ د – بەردەم چایخانەیەکیتر:

(( ڕۆستەم و سالم لەسەر کورسی لەبەردەمی چایخانەیەکیتردا دانیشتوون))

سالم: تەلەفونی بۆ بکە لە شوێنێک ببینین.

ڕۆستەم: زۆر باشە (( تەلەفون ئەکا)) باشی حەمەخدر گیان.......... ئەرێ چۆن بتبینین کاکە؟ شتێکی زۆر بەپەلەیە، بە خۆت نەبێ ناکرێ.................. هەروەک ئەوەی جاری پێشوو..... ئا ئا دەمخۆش........... درەنگ نییە؟................. ئەرێ ئیشی تۆ هەر نەبڕایەوە؟................ باشە دەی، عەسر سەعات ٣، من و سالم لای تۆین........ باشە گیان خواحافیزت بێ.

سالم: بۆ ختیە عەسر؟

ڕۆستەم: ئەڵێ تا سەعات ٢ و نیو بارمان هەیەو ناکرێ جێی بهێڵم، هەر لەگەڵ تەواو بووم ئەچمەوە ماڵەوە چاوەڕێتان ئەکەم.

سالم: باشە هەر خوا بکا لێ بێتەوە تا ئەو کاتە خراپ نییە، پیاو ئەترسێ ئیشی تری بۆ پەیا بێ.

ڕۆستەم: جا ئێمەش پێش ئەوەی بچین، تەلەفونیتری بۆ ئەکەین.

(( خەریکی چا خواردنەوەن، کە چایچیی بۆی هێناون))

Cut

دیمەنی – ٢٥٧ – ڕ/ن- ماڵی تایەر:

(( تایەر لەبەر ئاوێنە سەیری دەموچاوی خۆی ئەکا ))

تایەر: ئاهـ باوکەڕۆ، ئاخ پشتم... کورە خۆ شوێنێکم نەماوە نەیانکوتیبێ، خۆ دەرەقەتی براکەی هاتم، بەس نازانم ئەم دوو هەوشارە لە کوێوە هاتن و بۆ کوێیان بردم؟ ئاخر ئێوە بۆ لە ئیشی خەڵکا هەڵئەدەنێ؟.. سەگبابینە..؟ نە پۆلیسی و نە ئاسایشی، ئاخر بۆ واتان لێکردم؟.. بە بیللاهی شوێنیان ببینمەوە ناهێڵم بەسەریانەوە بچێ ئەو گەماڵباوکانە... خۆ ئاکارو شەماڵیش ئەڵێن با بیاندۆزینەوە، بەس لە کوێ؟ ئەها.. مەگەر شوێنی براکەی بدۆزمەوەو بچم لەو بپرسم، بەخوا وا دیار بوو ئەوانیش نەیناسن... جا بۆ تۆڵە لە براکەی نەکەمەوە... (( کەمێک ڕامان)) هەتیو تایەر دانیشە با ئەوەندەی تریشت نەکوتن، کورە گوو بەو دڵدارییەش تۆ کردت، باشە؟.. هەر وازی لێ بێنەو لە بیری خۆشتی ببەوە. ئەرەوەڵا.

(( هەر ئاخ و ئۆف ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ٢٥٨ – ڕ/ن – ماڵی خدر:

(( خدر بە جلی ئیشەکەیەوە دانیشتووەو نارەوەن دێتە ژوورەوە، تەوقەو بەخێرهاتن))

خدر: شتێک بکە سوودی زۆرە.

نارەوەن: تۆ جارێ پێم بڵێ، گەیشتی بە کابرای فریشتە؟

خدر: ئەی چۆن؟

نارەوەن (( هەڵئەسێت و باوەشی پیا ئەکا)): ئەک بە قوربانت بم کوڕە باشەکەی خۆم.

خدر (( خدریش دەستێک لە شانی ئەدا)): خوا نەکا خوا نەکا.. چەند خۆشحاڵم شەرەفی ئەوەم ئەدەیتێ ببم بە کوڕی خۆت!

نارەوەنجا خۆ هەر کوڕی خۆمی بەساقە.

خدر: جێی شانازیمە هەرچییەکت بم.

نارەوەن: کورە برام بە کوڕم بە باوکم بە هاوڕێم بە، بەدڵی خۆت.

خدر: با ئێستە بێینە سەر باسی خۆمان.

نارەوەن: ئیتر چی ئەمرەکەی فەرموو!

خدر: لای نیوەڕۆ بارێکی ئاو لای ئێمەوە دەرئەچێ، هەر کەسێک لەو دەوروبەرەوە دوای بکەوێ بزانێ بۆ کوێی ئەبا، یەکسەر دەرئەکەوێ کە دوای کەوتووە.

نارەوەن: ئێ باشە.. ئەوی لەسەر من پێویستە چییە؟!

خدر: بە شێنەیی لە شوینێکیترەوە دوای بکەوی، بزانی بۆ کوێی ئەبا؟ چونکە بەڕاستی من گومانی زۆرم لەو بارەی ڕێشار هەیە.. هەموو جارێک خۆی نەبێ ناهێڵێ کەس بچێ بەلایاو حەماڵی دەرەوەشی بۆ ئەهێنن.. بۆ هەر کەسێک بچێ، دیارە شەریکی کاری خراپن.

نارەوەن: ئینجا لەوە ئاسانتر نییە.. چی تیایە دوای ئەکەوم تا ئەو شوێنەی دایئەگرن.. سەعات چەند؟

خدر: کێشەکە ئەوەیە تەنها ئەمڕۆ ئەزانین کە نیوەڕۆ دێت، بە بێ ئەوەی سەعاتەکەی بزانین.

نارەوەن: دەی ئاخر من زۆر لەوێ بوەستم، کێ نالێ دارەوان نایەتە دەرەوەو نامبینێ؟

خدر: مەگەر سەیارەیەکیتر بهێنی.

نارەوەن: جا سەیارە لە کوێ، مەگەر بچم ئەوی ئاوای کوڕم بهێنم، ئەویش ئەناسێتەوە.

خدر: ڕاستە.. ئەی چۆنە لەو نزیکانە لە قاوەخانەیەک بیت؟ هەر لەگەڵ دەرچوون من ئاگادارت بکەمەوە؟ ئەگەر هەر دەرفەتیشم نەبێ، نامەیەکی سپیی بەتاڵت بۆ بنێرم.

نارەوەن: لە سەعات چەندەوە بچمە قاوەخانە؟

خدر: لە سەعات دوانزەوە. ئەوپەڕی تا یەک بار ئەکرێ، بەس ئەڵێم نەک زووتر دەربچن، با ئێمە پێش وەخت ئامادە بین.

نارەوەن: باشە بەسەرچاو، من ئەوە ئەکەم، تۆش شتێکم بۆ بکە.

خدر: من بە ڕوحم لەخزمەتدام دایە گیان.

نارەوەن (( پێکەنین)): توخوا مەڵێ دایە، لێت نایەت، هەر نارەکە خۆشتر بوو، باوەڕم پێ بکە دارەوانیش وای پێ نەوتووم، هیچ کەسێک..

خدر: ئاخر هی ئەوەیە زۆر لە من گەورەتر نیت.

نارەوەن: دەباشە کەواتە خانەکەش مەڵێ هەر نارەو تەواو.

خدر: باشە نارەگیان، ئەمرکە چیت بۆ بکەم نارە گیان؟

نارەوەن: وا بکە ئەو کابرایە ببینم و بە دڵ سوپاسی بکەم.

خدر: هیچ خەمت نەبێ، ئەوە لەسەر من.. ئەگەر ناسیاویشت بێ هەر ئەمڕۆ ئەیهێنمە خزمەتت.. کچێ ئەبێ دنیا خزمەتت بکا.

نارەوەن: واو بەڕاست؟ ئەمڕۆ؟

خدر: من خزمەتکاریت ئەکەم و بەڵێنی درۆت پێ نادەم.

نارەوەن: سوپاس خدر گیان.. (( تەماشای ژوورەکە ئەکا)) هەر ئەو عەلاگەی جلە زیادی کردووە.

خدر: ئەمڕۆ لەگەڵ دەستما هێنامەوە، لە مەزادخانەکە کڕیم، زۆر هەرزان بوو.

نارەوەن: سەر ئەو تەپڵەکەش پاکەتێک کلێنسی لێدانێ.

خدر: ئەمرەکەی.

(( لە میوتیدا حوارو پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٢٥٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر- ژووری ڕێژوان:

(( ڕێژوان و بروسک دانیشتوون))

ڕێژوان: زۆر پەلەت کرد، هەر زۆریش.

بروسک: نا کاکە، بەخوا لە جێی خۆیدا بوو، جا ئەوە ئەمشەویش ئەچین بۆ کەفارەتی گرتنەکەی.. ئیتر خۆت ئەزانی من چۆن دایئەمەزرێنم! کورە ئەیکەم بەداوا کردن هههه.

ڕێژوان: نا توخوا ئەوە نەکەی.

بروسک: من لە باوکتەوە فێری زۆر شت بووم ڕێژوان گیان.. شتە باشەکان لە کاتی خۆیدا بکرێ باشترە.

ڕێژوان: دە کەواتە ئەچین بە باوکم ئەڵێین.

بروسک: نە بابە، نەک شەوێ خەڵکی لێ بێت، یان بواری ئەو قسانە نەبێ.. لەوێ جەوەکە ئەیزانێ، بەڵام دڵنیابە بە هەندرێن هەر ئەڵێم بەو هیوایەی سبەی شەو لە ماڵ بیت، دێینە خزمەتتان.

ڕێژوان: دە بڵێم چی؟ ئیتر خۆت ئەیزانی

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٢٦٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار دانیشتووەو کرمانج لەبەردەمیدا ))

ڕێشار: ئەها ئەو نەعلەتییە کە ئیشم پێی بێ چۆن ون ئەبێ؟ تەلەفونی بۆ بکە بڵێ نیو سەعاتیتر لێرە بێت، ئەگینا بەخوا دارکاریی ئەکەم.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم، بەخوا ئەم خدرە نەبێ، قەت ئیشمان وا خێرا نارِوا.

ڕێشار: پێی بڵێ ئاوەکان باربکاو دواتریش ئەو زەیتە داگرێ.

کرمانج: ئەی حەماڵی خۆی لەگەڵ نییە ئاوەکان؟

ڕێشار: نا، وتیان هەر دوو تەنییەکە ئەنێرن، حەماڵەکانیان ئیشیان زۆرە، با هەر خۆشی سەرپەرشتی بکاو کارتۆنەکانم بۆ بژمێرێ.

کرمانج: ئەها یەعنی جەنابیشت سەرپەرشتی ناکەی؟!

ڕێشار: کرمانج کە شتێکت زانی، پرسیاری مەکە، بەخوا ئاوا زۆر زوو تیا ئەچی.

کرمانج: فەرمانتە گەورەم، ڕاستە. ئەچم تێلی بۆ ئەکەم.

(( کرمانج ئەچێتە دەرەوەو ڕێشار لە پشتەوە وەک ئەوەی ئاماژەی گەمژەیی ئەویش بکا ))

Cut

دیمەنی – ٢٦١ – ڕ/ن – ماڵی حەمە خدر - گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٢٥٨ -:

(( نارەوەن و خدر))

نارەوەن: ئیتر کەسێک نەیزانی ئەو دووە کێ بوون ئەو هەتیوەیان ڕفاند، تا ئێستاش هیچ ئەسەرێکیان نییە.

خدر: بەڕاستی سەیرە.. دڵنیابە ئەوانیشت بۆ ئەدۆزمەوە.

نارەوەن (( پێکەنین)): ئەها خوا منی چەند خۆش ئەوێ؟ هەر کەسی وەک تۆو ئەو فریشتانەم بۆ ئەنێرێ.

خدر: تەواو من مەخەرە ڕیزی کەسەوە، بە منت وت بووی بە بەختەبارانی من.

نارەوەن: ئەی وایە لەم کاتەیا تۆ دەرکەوتی، بەختە باران نەبی چیت؟ کێ خوا لە ئەخیری تەمەنیا براو کوڕی وای ئەداتێ؟

خدر: کچێ ئەخیری تەمەنی چی تۆ ئێستاش ئەڵێی ....... (( خدر زەنگی مۆبایلی گوێ لێ ئەبێ و بە پەنجەی ئاماژەی بێدەنگ بوونی نارەوەن ئەکا)) کاک کرمانجە.

(( نارەوەنیش ئەسڵەمێتەوە))

خدر: بەڵێ کاک کرمانج؟

کرمانج (( دەنگ)): ئەوە لە کوێی حەمەخدر؟ وا سەعات دوانزەیەو بە ملی شکاوت دیار نیت. (( نارەوەن تەماشای سەعات ئەکات و ئاماژەی سەرسوڕمان و دەست ئەگرێ بە دەمیەوە))

خدر: قوربان گیان وا هاتم.

کرمانج: دە وەرە، ئێستا سەیارەی ئاوەکە دێت و هەر خۆت باریکەو دواتریش زەیتەکە داگرە.. یەک چارەکیتر لێرە بیت.

خدر: سەرچاو قوربان گیان، سەرچاو (( مۆبایل دائەخرێتەوە)) ئەرێ خۆ ئاگامان لە خۆمان نییە، بەدەم قسەوە وا سەعات دوانزەیە.

نارەوەن (( بە پێکەنینەوە )): ئەرەوەڵا (( ئەکێشێ بە خدرا )) جا هەمووی خەتای تۆ بوو.

خدر: جا کاتێکی خۆش نەبوو؟

نارەوەن: هەر زۆریش.

خدر: دەی چاوی ڕێشارو کرمانج و زوبێریش دەرئەهات.

نارەوەن (( بە پێکەنین )) ئەرەوەڵا هەر هەموویان.

خدر: دەی خۆت کۆکەرەوە با خێرا بڕۆین.. تۆ بچۆرە قاوەخانەکەو چاوەڕوانی ئاگادار کردنەوەی من بە.. کە تەواویش بووی بچۆرەوە بۆ ماڵەوە، کابرا ناشرینەکەت بۆ ئەنێرم.

نارەوەن (( بەدەم هەستانەوە )): توخوا وای پێ مەڵێ، ئەوە ڕوحە ڕوح، با منداڵت ببێ ئەوکاتە ئەزانی، قیمەتی ئەو کەسە چەندە لە هەڵوێستێکی ئاوادا، گەورەترین کارەساتت لێ دوور ئەخاتەوە.

خدر: ئاخر دوایی من پشت گوێ نەخەی کە ئەوت بینی.

نارەوەن: کورە حسابی تۆ لەگەڵ هەموو کەسێکا جیاوازە بەساقەوبم.. تۆ پشت و پەناو باوک و کوڕو براو هەموو کەسی منی.

خدر (( سوعبەت )): دە ئیتر پێم بڵێ باوکە.. دەی هەستە کچم پێشمکەوەو بشمگەیەنە ئەو نزیکانە هههه.

نارەوەن: ئەوە دوو سەعاتە سەیارەکەم لەبەر دەرگایە، ئاخۆ ئەو دراوسێیانە بیبینن بڵێن چی؟

خدر: کچێ چاوی هەر هەموویان دەرئەهات، تەقسیریی نەکەن.

(( بە پێکەنینەوە ئەچنە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ٢٦٢ – ڕ/ن – قاوەخانەیەک:

(( دڵنیا کچێکی گۆشتنی جوان، تەمەنی نزیکەی ٢٥- ٢٨ ساڵان، زۆر بێتاقەتە.. لەگەڵ شەنیا دانیشتوون.. ))

شەنیا: گوێی مەدەرێ دڵنیا گیان، کە ئەو تۆی ناوێ، تۆ بۆ وا دڵی خۆتی بۆ تەنگ ئەکەیت؟

دڵنیا: من دڵم بۆ بێ دەماغییەکەی خۆم سەغڵەتە، بۆ گێلێتیی و سادەییم.. من خۆشەویستییەکی نموونەییم لەگەڵا کرد، کێ ئەیوت هەرمان لەو کوڕانەیە ژمارەی کەپڵەکانیان زیاد ئەکەن بۆ سنگ دەرپەڕاندن؟ کچێ زۆر داماو دەرئەکەوت.

شەنیا: نا بەساقە لای تۆ داماو دەرئەکەوت، ئەگینا چەندجار من و دەوران پێمانوتی بە سەرکزییەکەیا تێ مەکەوە، لە چاویا تەنها فرتوفێڵ ئەبینی، کەچی تۆ گاڵتەت پێ ئەهات.. کاتی زەرزەنشت نییە، ئارامبە، بیری خۆتی بەرەوە.

دڵنیا: دوو ساڵە بڕیاری هاوسەرگیریمان داوەو ڕۆژ نەبووە بە هیوایەکی تازەوە نەچمە دەرەوە، بیری خۆ بردنەوەی چی شەنیا گیان؟ خەونی گەورەم بوو.

شەنیا: دەی بڵێین چی، ئیتر ئەوە هەموو وەفاکەی بوو.

دڵنیا: شەرتبێ لە تۆڵەی ئەو ئازارەیا پێی چەشتم، بەزمێ بە کوڕان بکەم بە خەویش بیبینن لە ترسا ڕاچڵەکێن، تەنها بەدوای ئەوانەشا ئەگەڕێم کە کەپڵ و ژنی خۆیان هەیە، بزانە چۆن تۆڵەی خۆم ئەکەمەوە؟

شەنیا: دانیشە کچێ، بەرگەی ناوزڕانێکیتر ناگری، هەموو دنیا ئەیزانی تۆو هەرمان پێکەوەن، پێم ئەوتی ئەوەندە خۆت بەرچاوی خەڵک مەخە، ئەتوت جا ئێمە بۆ یەک ئەبین، یاڵڵای ئەکرد هەموو دنیا پێکەوە ئەیبینیین.. تۆ بە حسابی خۆت منەتت بە کەس نەبوو، بەڵام ئەو لە پشتەوە وەک دووپشکی ڕەش پێوەیدای.

دڵنیا: تۆ بەس سەبرم لێ بگرەو بمبینە چی ئەکەم.

شەنیا: هیچ لەگەڵتانیم. ______ Cut ______

دیمەنی – ٢٦٣ – ڕ/ د – قاوەخانەی تریفە:

(( دارەوان لای تریفەوە دانیشتووەو هەڵشۆ بە پێوە))

دارەوان: ئەو دووەی لە پشتەوە ئیش ئەکەن با یەکێکیان بەردەوام نزیکت بێ و ئاگادارت بێ.. خەمی هیچت نەبێ کچم.. با هەڵشۆش بچێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی وا دادوبێدادیەتی بەدەست ئێرەوە.

تریفە: ئێ با بڕوا، کەی ئیشی بۆ من کردووە تا ئێستا ئیشم بۆ بکا، ئەو چاوی بە ئێرەیا هەڵنایەت لەبەرئەوەی بەناوی منەوەیە.

هەڵشۆ: نا لەبەرئەوە نییە تریفە گیان، لەبەرئەوەیە تۆ خۆت کردووە بە سوڵتانی ئێرەو ئەوەش نیشانی خەڵکەکە ئەدەی.. بەڕاستی منیش حەزم بەوە نییە.

دارەوان: دەی ئیتر بیبڕنەوە، تاقەی ئەم شەڕە دەنووکەم نییە.. ئیتر وەک وتم ئاوا بکەن و من ئەچمەوە سەر ئیشی خۆم، پەلەمە.

(( تریفەو هەڵشۆ بەسەرچاو ئەکەن و دارەوان بەڕێ ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٢٦٤ – ڕ/ د – بەر مەخزەنی ڕێشار:

(( سەیارە دوو تەنییەکە وەستاوەو خدر بە ڕاکردن بەرەو لای ئەچێ))

خدر: توخوا ببورە کاک کرمانج، کەمێک دوور بووم.

کرمانج: ئاساییە کاکە ئەویش ئێستا گەیشت.

(( خدر ڕائەکاتە ژوورەوەو چەند بتوانێ کارتۆنە ئاو هەڵئەگرێت و فرێی ئەداتە سەرەوە.. دوای سێجار خۆی هەڵئەداتە سەرەوەو لەسەرەوە ڕێکیان ئەخا))

Cut

دیمەنی – ٢٦٥ – ڕ/ن – قاوەخانەیەکیتر:

(( نارەوەن لە قاوەخانەکە دانیشتووەو نیسکافە یان قاوە، هەر شتێکی لەبەردەمدایە.. ماوەیەکی پێ ئەچێت و زەنگی بۆ دێت، وەڵام))

خدر (( دەنگ)): هەر لەو قاوەخانەیەی ئەمبەرەوەی؟

نارەوەن: بەڵێ.

خدر: دەی خێرا بچۆ سەیارەکەوە نارە گیان، ئێستا ئەگاتە بەردەمت.. بەس کارتۆنی ئاوە بچووکەکانە.. ئاگات لە خۆت بێ چاوەکەم.

نارەوەن(( بە پەلە پارەیەک ئەدا بە کاشێرو چاوەڕوانی باقی ناکات و لە قاوەخانەکە ئەچێتە دەرەوە)): خوات لەگەڵ.

——— تابع ——————— Cut ———————————

دیمەنی – ٢٦٦ – متبوع – ڕ/ د – بەردەرگای ئەو قاوەخانەیەی لێی بوو:

(( نارەوەن زۆر بەخێرایی دێتە دەرەوەو ئەچێتە ناو سەیارەکەیەوە، کە لەسەر جادە ڕاگیراوە، سلف لێ ئەدات و سیارە دوو تەنییە پڕ ئاوەکە بە بەردەمیا دێت، وردە وردە دوای ئەکەوێت، لەناو سەیارەکەی گۆرانی حەسەن زیرەک هەیەو لێی ئەدات و لەگەڵیا ئەیلێتەوە.. بەوجۆرە بەدوای سەیارەکەوە ئەبێ))

تابع ——————— Cut ———————

دیمەنی – ٢٦٧ – متبوع – ڕ/ د – ناو سەیارە دارەوان:

(( دارەوان سەیارەکەی نارەوەن ئەبینێ))

**دارەوان مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

ئەوە بەم نیوەڕۆیە کەی وەختی سەردانی تریفەیە؟ (( ڕامانێک)) دیارە ئیشی پێیەتی.. هەر نەشزانێ بینیومە باشترە.. گوناحیشە، داماوە کێی هەیە لە ئێمە زیاتر؟ با دڵنەوایی بکرێ بۆ خراپە؟

——— تابع ——————— Cut ———————————

دیمەنی – ٢٦٨ – متبوع – ڕ/د - بەدوای دوو تەنیەکەوە:

(( دوو تەنییەکە لە پێش نارەوەنەوە ئەڕوات بەرەو قاوەخانەی کچەکەی.. بەڵام قاوەخانەکە نیشان نادرێت))

نارەوەن (( حەپەساو و ترس)): ئەوە چییە؟ ئای خوا هاوار (( بە هەردوو دەستی ئەکێشێ بەسەری خۆیداو ئەوەستێ)) خوا هاوار ئەوەی ئەیبینم ڕاست نەبێت و ئەو

(( بارە ئاوەکە لەبەردەم قاوەخانەکەی تریفەی کچی ئەوەستێت و دوو شاگردەکەی تریفە دێن دایئەگرن))

نارەوەن: ئەڵێم خوایە بۆچی لە خوتوخۆڕایی هەوڵی کوشتنی کچەکەم ئەدرێ، دیارە ئەم بێ ئەقڵە دەستی لەگەڵ ڕێشارا تێکەڵە، کە دوژمنی سەرسەختی باوکییەتی.. ئای خوایە ئێستا من چی بکەم؟.... بەس خدر شک ئەبەم پێی بڵێم، بەخوا بەدارەوان بڵێم کوت کوتی ئەکا.. نا نا هەر بە خدر بڵێم چی بکەم باشە.

(( بەسەیارەکەوە وەرئەچەرخێت و ئەگەڕێتەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٦٩ – ڕ/ن - کۆمپانیای ڕێشار:

((ڕێشار دانیشتووە تێل ئەکا))

ڕێشار: پاشا گیان جەنابت زۆر وردی، لەسەر قسەی جەنابت، کرمانجیشم هێنایە ڕیزەوە.. ئەو کابرایە سەرەتا وا خۆی نیشاندا ئەترسێ، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت تەنها دەرفەتی بۆ نەلواوە، ئەگینا لە من زۆر زیاتری ئەکرد.......... بێخەمبە پاشا گیان، هەموو شتەکان لە جێی خۆیدان، کارەکان زۆر باش ئەڕوا، هیچ هەڵەیەک ناکرێ.......... بەڵێ پێموتوون سبەی ئەچینەوە بۆ مەرز، هەروەک جاری پێشوو، دیارییەکەی ئەمجارەشیانم نارد بۆ قەزاکەو لەوێ شتەکانمان بۆ ئەپێچنەوە......... نا گەورەم، بەڵێ موکیاج نییە، ئەمجارە دوو کارتۆن جلی ژێرەوەیە، وا ڕێک ئەخرێ جێی هەر شەش کیلۆکەی تیا ببێتەوە......... بەڵێ هەندرێنەکەشیان بە کەفالەت ئازاد کردووە.......... منیش پێم سەیر بوو....... جا قوربان پۆلیسی نهێنیش بێت چی ئەزانێ، خۆ سەیری کارتۆنە جلەکان ناکاو هەر ناشهێڵم دەستی بەریان بکەوێ.......... زۆر بێخەمبە پاشا گیان..... بەڵێ سبەی....... خوا ئاگادارت بێ، خواحافیز..

((ئەیەوێ هەستێ بچێتە دەرەوە، کرمانج دێتە ژوورەوە))

ڕێشار: ئا باش بوو کرمانج، باش بوو هاتی، سبەی کە ئەڕۆین فێری ئەوە ئەبی، چۆن بازرگانیەکەشی بکەیت و خۆشت تاوانبار دەرنەچیت ئەگەر گیرا.

کرمانج: هەر لە ڕێگەی کچەکانەوە؟

ڕێشار: ئیتر ئەبێ مێشکت بجوڵێنی و لەو جۆرە کەسانە بکەی بە نێچیری کارەکە.. خۆمان بگیرێین تیا ئەچین، بەڵام ئەوان بگیرێن، ئێمە پارە زەرەر ئەکەین.. با جارێکیش بگیرێ، هیچ نییە، بەوانیتر قەرەبووی ئەکەینەوە.

کرمانج: کەواتە ئیتر منیش پاسەوانی نهێنیی بۆ خۆم دابنێم.

ڕێشار: بێ ئەقڵ زۆر دەمێکە بۆم داناوی، باش هەڵمسەنگاندوویت، ئەوسا متمانەم پێکردووی، جگە لەوەش نەمئەویست لە دەستم بچی، بەرەوام تۆم پاراستووە.

Cut

دیمەنی – ٢٧٠ – ڕ- عەسر/ د – بەردەمی ماڵی خدر:

(( ڕۆستەم و سالم لەسەر سوچێک وەستاون، تێل ئەکەن))

ڕۆستەم: لە ماڵیت بێم؟........... ئەرەوەڵا نزیکی ماڵەکەی تۆم ............. ئەی لە کوێی برا؟ ...................... بابە ئیشی چی؟ ئیشەکەی خۆمان بە جارێک خەنیت ئەکا، ئیتر واز لەو کۆڵە قورسانەش ئەهێنیت................. دەی باشە، با ئەمجارەش قسەی تۆ بێ و بیخەینە شەو............ ئاخر ئیتر دەسخەڕۆم نەکەی حەمە خدر، من ئەبێ جواب لەو پیاوە بگێڕمەوە...................... دە باشە دەی خواحافیزت بێ.

سالم: ئینجا بۆ شەو؟

ڕۆستەم: بەڵێ کاکم ئەڵێ بە ژیانم ئەوەندە ئیشم نەبووە، هەزار سوێندی خوارد شەو لە ماڵەوە بێ سەعات هەشت..

سالم: دەبا بڕۆین کەوایە!!

(( ئەڕۆن و لەچاو ون ئەبن، خدر دەرگا ئەکاتەوە بۆ دڵنیایی و دایئەخاتەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٧١ – ڕ/ ن – قاوەخانەی تریفە:

((تریفە لە شوێنی خۆی، یەکێک لە دوو کرێکارەکەی ژوورەوە لەسەر مێزەکەی تەنیشتی دانیشتووە، بێستان دێت بۆ لای و پاش یەکتر ماچ کردن و سڵاو))

بێستان: بەیانی ئەچینەوە بۆ سەر مەرز، حەزت لە چییە بۆت بێنم؟

تریفە: یاخوا سەفەری خۆشیی بێت بێستان گیان، وەڵا هەر خۆشیی و سەلامەتیت.. تۆ پێم بڵێ هیچت پەیا نەکردووە؟ هههەه

بێستان: کچێ منی داماو و پەیا کردن؟ بەڵام لە نێوانمان دەرنەچێ، کەمێک ئەو کاک کرمانجەم بە دڵەو ئەویش جاروبار ئەهـ (( سەر ئەخا بەمدیوەو دیوا ))

تریفە: دە کچێ ئیتر تاکەی؟ خۆ پیاو ناتخوا، ئەو هەموو ڕەقییە چۆن لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەتدا ئەگونجێ؟

بێستان: ترسەکەم هەر ماوە.. بۆ ئەویش ناوێرم حەزی خۆم نیشان بدەم.

تریفە: دەی بەڵکو ئەو ئازابێ، زووتر بێتە پێشەوە.

بێستان: کاک ڕێشار وای نەتۆقاندوون، یەکێکیان بوێرێ قسەیەکی بە جۆرێک بکا.. هەموو ئەڵێی براو باوکمانن.

تریفە: ئەویش نەگبەتییە هههههه.

بێستان: ئەرەوەڵا ئەی چی؟

خورشید (( دێتە ژوورەوە، دوای سڵاو، بە بێ ناوهێنان)): ماڵەکەم پیتزاکان، هەروەکو جاران، ١٥ دانە.

تریفە (( بۆ کرێکارەکەی تەنیشتی)): هەستە پیتزاکانی بۆ دروستکە.

(( کرێکار بەڵێ باش ئەکات و خورشید لە جێی کرێکارەکە دائەنیشێ و تریفەو بێستانیش سەرگەرمی قسە ئەبن)) ________________ Cut

دیمەنی – ٢٧٢ – ڕ / د – بەردەمی ماڵێ خدر:

(( نارەوەن، زۆر تورەو بێ میزاج و گرژ، سەیارەکە ڕائەگرێت و دائەبەزێ، ئەبینێ دەرگا کراوەتەوە یەکسەر خۆی پیا ئەکا بۆ ژوورەوەو دایئەخاتەوە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٢٧٣ – متبوع – ڕ/ن – ماڵی حەمە خدر:

(( حەمە خدر لەبەری هەڵئەسێت، نارەوەن دائەنیشێت و ئەگری و سەری لە ناولەپی خۆیا ون ئەکاو خدر دڵدانەوە))

خدر: چی بووە نارەخان؟....(( نارەوەن ئەگری)) ئای!!! نارە خان گیان بۆ ئەگریت؟ دە پێم بڵێ.

نارەوەن (( بەدەم گریانەوە)): ئەو بارە یەعنی بۆ هەر شوێنێک چووبێت، دەستی تێکەڵە لەگەڵ ڕێشار؟

خدر: ئەوە بە دڵنیایی، چونکە نهێنییەکی تیایە ڕێشار ناهێڵێ کەس بیزانێت، ئەمجارەش دڵنیام هەر بۆ ئەوەی گومانی هەموو کەسێک بڕەوێنێتەوە، جەردو بارکردنی بە من سپارد.. بۆ ئەو پرسیارە ئەکەی؟

نارەوەن: دەی ئێستا تێگەیشتم بۆ هەوڵی کوشتنی تریفەیان داوە.. ئەزانی بارەکە بۆ کوێ چوو؟

خدر: نا.. بۆ کوێ؟

نارەوەن (( ئەداتە پڕمەی گریان و هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە ئەگرێ)): بۆ قاوەخانەکەی تریفەی کچم!!!!

خدر: تکایە مەگری و بە قسەم بکە، ئێستا ئەبێ تێ بگەین نەک بگرین... دەی تەواو، باتێبگەین.

نارەوەن (( کەمێک هێور بوونەوە)): لە چی تێبگەین؟ بە چاوی خۆم بینیم.

خدر: بۆ مەسەلەی کوشتنی تریفە، هیچ پەیوەندیی بەو بارە ئاوەو ئەو شتەوە نییە کە بۆ ئەوێ ئەچێ.

نارەوەن: چۆن؟

خدر: هێور بوویتەوە؟

نارەوەن(( پاش کەمێک)): باشم.

خدر: من زۆر بەو بابەتەوە ماندوو بووم و دڵنیا بووم لەوەی نە ڕێشار هەوڵی کوشتنی داوەو نە کەسێکیش لە دژی ڕێشار ئەوەی کردووە.

نارەوەن: ئەی کێ بوو؟

خدر: با بمێنێ ئەوەیان، چونکە تەواو نەگەیشتوومەتە ئەوەی دڵنیابم.. ئەوەندەی بشزانم ئەو کەسە لە هەوڵی کوشتنی تریفە پەشیمان بۆتەوە.

نارەوەن: دەی کەواتە تۆ ئەزانی کێیەو بە من ناڵێی؟!

خدر: نا.. نایزانم، تا تەواویش دڵنیا نەبم ناتوانم پێت بڵێم.

نارەوەن: ئەی ئەم ئاوە بۆچی ئەچێ بۆ تریفە، لەکاتێکا کۆمپانیای ئاوەکان زۆر بە هەرزانتر ئەیفرۆشن؟

خدر: چاوت لێیە؟ کەواتە لەبری گریان و فینگە فینگ، ئەبێ تۆ شتێکیتر بکەی.

نارەوەن: چی بکەم؟

خدر: ئەچیتە لای تریفە بێ ئەوەی هیچ شتێکت زانیبێت.. لەناو قسەشدا لێی بپرسە ئەو ئاوەت لە کوێوە بۆ دێت، ئایا ئاگادارە، ئاگادار نییە؟ کێ ناڵێ تەنها مێردەکەی ئاگادار نییە؟ چونکە ئەوە قاوەخانەی خۆیانەو هەر ئەبێ یەکێکیان یان هەردووکیان ئاگادار بن.

نارەوەن: ئافەرین، زۆر ڕاستە، ئەبێ ئێستا ئەوە بکەم (( ئەیەوێ هەستێ، خدر دەستی ئەگرێ دایئەنیشێنێتەوە)) نەڕۆم؟

خدر: بەو سەروچاوە شێواوەو بەو گرژییەوە بچیت، ڕاستەخۆ ئەزانێ شتێک ڕوویداوە.. ئەوە ئێستا مەکە.. بیخەرە سبەی، دوو سبەی.. تۆ ئەتوانی شتێکی گرنگتریش بکەی.

نارەوەن: ئەوەیان چی؟ هەرچی بڵێی ئەیکەم خدرگیان، بەس توخوا با مناڵەکانم پارێزراو بن.

خدر: خەمی ئەوەت نەبێ من لە پشتتم.

نارەوەن: ئەک خوا تۆم بۆ بهێڵێ خدر گیان، جا خۆ تۆ نەبوویتایە، ئەمڕۆ دڵم ئەوەستا.

خدر: خوا نەکا.. تۆ هەموو شتێکی منیت، ناتوانم قەت چاکەی تۆ بدەمەوە..

نارەوەن: وتت چی بکەم؟

خدر: سبەی زۆر زوو وەرە دەرەوە.

Cut

دیمەنی – ٢٧٤ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( ڕێژوان و زوبێر))

ڕێژوان: باوکە بە کاردۆشم وت وەرەوە شتێکی وام بەدەستەوەیە.

زوبێر: جا بۆ پێتوت کوڕم؟ بەڵێنیشت پێ بدا دڵنیام نایەتەوە.

ڕێژوان: نا بەڵێنیشی نەدا، هەر بە ساردییەکەوە وتی منت بۆچییە؟ پیرۆزت بێ.

زوبێر: لە منداڵییەوە هەروابووە، زۆر ساردو کز بووە لەگەڵمانا.. جا تۆ ئیشت بەو چییە؟

ڕێژوان: نەوەڵا هیچ ئیشم پێی نییە، بەڵام وتم برایەو با لە داواکردن و ژن گواستنەوەما بێ.

زوبێر(( هەڵئەسێ)): درەنگە وا ئێوارەیە، با فریای خۆشتنێ بکەوین.

ڕێژوان: فەرموو باوە گیان فەرموو.

(( ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٧٥ – ڕ/ن - ژووری عەمید سەرکۆ:

((عەمید سەرکۆو نەقیب ڕاهۆز دانیشتوون))

سەرکۆ: بەڵکو سبەی لایەک بە لایەکا بکەوێ.. ئەو بارەی دێتەوە لە ڕێی یەکێکەوە وا بکە شڕوشیتاڵی دەربهێنن.. ئەگەر پێویستیشی کرد مەفرەزەیەک ئەنێرم و خۆت بیپشکنە.. لەو بڕوایەدام شتێک هەر ئەدۆزنەوە.

ڕاهۆز: بەو هیوایە گەورەم، ئومێدم زۆرە.

سەرکۆ: ئەرێ ئەڵێی ئەمشارە کۆمپانیایەکیتری تیا نییە ئەم دوو سەر بەگۆبەنە نەبێ.. ئەوانیتر وەک مێو و ڕۆن ئیشیان ئەڕواو ئەسڵەن هەر پێویستیان بە چاودێری کردنیش نییە، خۆیان زانیاریی ڕاست و دروستمان ئەدەنێ و ئیتر بێ کێشە ئیشیان ئەڕوا.. کەچی ئەم دوو ئافاتە، کاتی زۆرمان ئەبەن.. بیللاهی بەشتێکەوە بگیرێن، ئەبێ کۆن و نوێیان لەسەر بکەم بە ماڵ.. با جارێ وا بڕۆن.

ڕاهۆز: ئیشەکەش خۆشە گەورەم، من حەزم بە ماندوو کردنی مێشک هەیە.

سەرکۆ: ئەوە بکە بە ئامۆژگاریی لە منەوە، ئەمجۆرە ئیشانە چێژی زۆر تایبەتیان هەیە، گەر بۆچوونەکانت دروست دەربچن.. بەڵام گەر تۆ بیر لە شتێک بکەیتەوەو ئەوان بە ڕێیەکی تردا بڕۆن؟! خۆت لە قەرەی ئەمجۆرە ئیشانە مەدە.. ئەمەت بۆیە پێ ئەڵێم، چونکە لە بیرتیژیی و زیرەکیی تۆ دڵنیام، تۆ ئەفسەرێکی باشیت.

ڕاهۆز: زۆر سوپاس گەورەم.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٢٧٦ – ش/ن –ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار دێتەوە بۆ ماڵەوە، دەرگا ئەکاتەوەو ڕەحمانی خزمەتکار ئەبینێت بە چەقۆ کوژراوە..

# (( ئەڵقەی چواردە))

ئەشڵەژێت و تەلەفون بۆ کرمانج ئەکات))

ڕێشار: کرمانج بە پەلە بگە لای من ڕەحمان کوژراوە.

(( ئەچێ دەستێک ئەدا لە ژێر ملی و دەستی خۆی ئەکێشی بە یەکدا، تەلەفون بۆ پۆلیس ئەکا))

ڕێشار: پۆلیسی فریاکەوتنە؟ ... ........ کە گەڕامەوە خزمەتکارەکەمم بە کوژراویی بینییەوە (( ڕێشار بەردەوام ئەبێت لە قسە کردن و بە دەست ئاماژەی ئەوە ئەکا، کە ناونیشەنیان بۆ هەڵئەدا.. کرمانج دێتە ژوورەوە، ڕێشار تەلەفون تەواو ئەکا))

کرمانج: ئەوە چییە گەورەم؟

ڕێشار: نازانم کە هاتمەوە بەمجۆرە بینیم.

کرمانج: ئای خوایە، جا بەستەزمانێکی وا چیکردووە؟ (( کرمانج ئەیەوێ بچێتە لایەوە دەستی تێوە بدا)) بەڵکو مابێ.

ڕێشار: لاچۆ لە لایەوە، تا پۆلیس دێت با دەستی لێنەدەین... ئای خوایە چەند دڵسۆزم بوو، زۆر بەوەفا بوو، پاک لەگەڵ منا.. ئەگەر ئەزانم کێ کوشتوویەتی.. ئاخخخخخ؟ .. نازانم گومانیشم بۆ کەس ناچێ، هیچ کەسێک.

(( لە میوتیدا قسە کردن و گەیشتنی پۆلیس و گرتنی چەند وێنەیەک و کشفی محل الحادث و گەڕان بە دەرگاو پەنجەرەکانداو جێ پێ هەڵگرتنەوەو تخطیطی جثة و

هەڵگرتنی پەنجە مۆری بۆ ئەکرێ و لەگەڵ ڕێشارو کرمانجدا پۆلیس ئەچنە دەرەوەو ٤ کارمەندی تەندروستی لاشەکە ئەخەنە سەر نقالەو ئەیبەن))

Cut

دیمەنی – ٢٧٧ – ش/ن –ماڵی هەندرێن:

(( زوبێرو بروسک و چیمەن و ڕێژوان و هەندرێن و تافان و سەلواو باڵاو کڵپە لە دیمەنەکەدان.. سەلوا ڕیزێک نیسکافە ئەگێڕێ، وەرگرتن و سوپاس کردن))

هەندرێن: ماڵیان ئاوا بێ، ئەوان زوو تێگەیشتن ئەوە داو بوو بۆ من نرابۆوە..

زوبێر: هەزارجار ماڵیان ئاوا بێ.. هەڵبەت داماوی وەک تۆ دوژمنایەتی کەست نەکردووە، بۆیە ڕەنگە ئاسان بێ بزانی کێی لە پشتەوەیە؟

هەندرێن: گەورەم هەرکەسێک بێ من حەواڵەی ئەو خوا گەورەیەی ئەکەم، چار چییە؟

بروسک: شوێنی کارەکەت بە دڵە؟

تافان: نەوەڵا کەسمان بە دڵمان نییە، بەڵام ئیتر بڵێین چی؟ وا تێوەگلاوین، ناوێرین بەجێی بێڵین.. وا بەیانیش دووبارە ئەمانبەنەوە بۆ سەر مەرز.. خوا ئەزانێ ئەمجارەیان کاممان تێوە ئەگلێنن.

هەندرێن: خوا کەریمە ژنەکە ئەوەندە نا ئومێد مەبە.

تافان: دەی بەخوا من پێم باشە ئەمجارەشیان هەریەکەو لە سەیارەیەکیانا بین، با ئەگەر شتێک ڕوویدا یەکێکمان تیا بچین..شتومەکیش لەگەڵ خۆمانا نابەین، نەک خێرەومەندێ سەرمان بدا بە فەتارەیەکا.

ڕێژوان: وەڵا ئەوە حاڵ نییە ئێوەی تیان.. وا نییە باوکە؟

زوبێر: دەرفەتێک بدۆزنەوە، بە ئاشکرا پێی بڵێن ئەو ئیشەمان بۆ ناکرێ.. قسەکەی ڕێژوان تەواوە.

هەندرێن: من خەمی تافانمە، ئەوەندە دەربایسی خۆم نییم.

کڵپە: دە با منیش بێم باوکە.

باڵا: دە توخوا باوکە مەچن ئەگەر ئێوە بگیرێن، ئێمە چی بکەین؟

زوبێر: لەبەرچاوی ئەو منالآنە هیچ باس مەکەن، بەوەیا تێنەکەون کە منالْن، هەموو شتێ تێ ئەگەن.

بالآ: ئێمە گەورەین منالْ نیین.

(( چیمەن هەر لای سەلواوەیەو قسە ئەکەن))

بروسک: دەی ئیشەڵڵا بە سەلامتیی و دڵی خۆشەوە بگەڕێنەوە.. بە ئیزنی مامم ئەڵێم، کە گەڕانەوە، سبەی شەو هیچ ماندوون.. دوو سبەی شەوەکەی دێینە خزمەتتان.

(( سەلوا، چیمەن هەڵئەسێنێت و ئەچنە ژوورێکیتر))

هەندرێن: ماڵی خۆتانە، هەرکات ئێوە تەشریف بێنن شانازییە بۆ ئێمە.

زوبێر: ئیتر وا کاکە بروسک تەقاندی، بە ناچاریی ئەبێ بڕۆین، دوو سبەی شەو ئیشەڵڵا دێینەوە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ بە پێوەو ڕۆشتنی ماڵی زوبێر))

Cut

دیمەنی – ٢٧٨ – ش/ د – ماڵی خدر:

(( خدرو ڕۆستەم و سالم دانیشتوون))

ڕۆستەم: ڕاستە ئێمە ناتوانین بچینە ناو کۆمپانیاکەوە، بەس خۆ لە دەرەوە ئەتوانین چاودێریی بکەین.

خدر: کاکە ئەو دەوروبەرەی هەموو بە کامێرای چاودێریی و پاسەوانی نهێنیی تەنیوە، گەر زۆر بەوێدا بێن و بچن زۆر بە ئاسانیی ئەگەنە سەرتان.. خۆ منیش ناتوانم بە بەردەوامیی چاودێریی بکەم.

سالم: ئەی چی بکەین؟

خدر: بچنەوە پێی بڵێن وەزعەکە ئاوایەو ئەو کابرایە زۆر مەترسیدارە، بڵێن دڵنیابە فتی ئەکەین، بەس کاتی زۆرمان بدەرێ.. کاکە وا نەبێ سەری هەموومان ئەچێ بە قوڕا.

سالم: خۆ خۆیشی وتی پەلە مەکەن و بە شێنەیی کارەکە بکەن.

خدر: ئەی تەبعەن برا، خۆی ئەزانێ وەزع چۆنە.. خەمتان نەبێ، لە ماوەی مانگێکدا وەک بزنە کێویی ئەکەوێتە ناو قەرەوڵەکەتانەوە.

ڕۆستەم: دەی کە وابێ، ئیشی ئێمەی تیا نییەو خۆت شوێنەکەی دیاری ئەکەی ئەمجارەیان..

خدر: زۆر دڵنیابن، خۆم تەلەفونتان بۆ ئەکەم و کە هاتن ئەڵێم سەعات ئەوەندە لە فلانە شوێندا.

سالم: ئەی ئەگەر زیاتر دواکەوت؟

خدر: برا دڵنیابە من زۆر لە تۆ زیاتر حەزم لە پارەکەیەو هەر ئەبێ ئەمەیان بکەین.

(( بەدەم هەستانەوە حوار لە میوتیدا هەیە))

Cut

دیمەنی – ٢٧٩ – ش/ د – بەردەرگای بنکەی پۆلیس:

Mute

(( ڕێشارو کرمانج دێنە دەرەوەو ئەچنە سەیارەی ڕێشارەوەو ئەڕۆن))

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ۲۸۰ – متبوع – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

۱-(( ئەکرێت بە میوتی چەند دیمەنێکی گەڕانەوەی ڕێشارو کرمانج نیشان بدرێ))

۲- (( ڕێشارو کرمانج دێنە ژوورەوەو دائەنیشن))

کرمانج: یەکێک بانگکەین ئەو خوێنە بسڕێتەوە؟ یان خۆم بیکەم؟

ڕێشار: کورە نەبابە خوێن سڕینی چی؟ فەرشەکە فڕێدەن......... (( زەنگی مۆبایل)) بەڵی پاشا گیان..... هەر کرمانجم لایە......... نابەسەری جەنابت لای کەس نەمدرکاندووە ........... بەڕاستتە؟ یەعنی جاسوسێک لە ماڵەکەما بووەو نەمزانیوە؟ .................. دەستخۆش گەورەم، تەواو ئیتر بێخەمم...................... بەڵێ سبەی سەفەرەکە ئەکەین. ..... خوات لەگەڵ پاشا گیان.

ڕێشار(( ڕامانێک)): کرمانج! من بۆ تۆم باسکرد، هەندرین چۆن تووش ئەکەین؟

کرمانج: نەخێر گەورەم، تەنها وتت دوایی بۆت باس ئەکەم.. بۆ خێر گەورەم؟

ڕێشار: نا بۆم باسکردی.

کرمانج(( ترس)): نا هەر ئەوەندی فەرمووت دوایی هەموو شتێکت تێئەگەیەنم.

ڕێشار: دواتریش پێت وتم ئەو تلیاکە چۆن پەیا ئەکەی؟

کرمانج: ئۆو ڕاست ئەفەرمووی گەورەم، وەڵاهی هەر بیریشم نەمابوو، بەڵێ ئەوە بەوەیا بیرم کەوتەوە.

ڕێشار: من پێت ناڵێم بۆچی درۆم لەگەڵ ئەکەی، چونکە درۆزن بیت بە درۆیەکیتر وەڵامم ئەدەیتەوە.. بەڵام پێت ئەڵێم ئەو لاشەیەت بینی؟

کرمانج: بەڵێ گەورەم.

ڕێشار: هەر کەس بچووکترین ناپاکیی بکا، ئەوە چارەنوسیەتی لای ئێمە.. ئێمە ئاسان نیین کرمانج، ئەمە یەکەم و دوا ئامۆژگاریمە بۆ تۆ، نەخڵەتابی شتێ بکەیت و وەک ڕەحمان بتبینمەوە.

کرمانج: جا گەورەم تۆ ئاوا لە من ڕائەبینی؟ من سەرم لەبەرپێتا دائەنێم.

ڕێشار: ئێمە سبەی ئەچینەوە بۆ سەر مەرز.. تۆ لێرەبە.. دڵنیابە لە بارێکی ئاسایی زیاتر نییە.

کرمانج: گەورەم وا تێ ئەگەم گومانت لە دڵسۆزییم هەبێت؟!

ڕێشار: گومان نییە، هەڵوێستە کردنە.. پۆلیس بە چیرۆکی هەندرێنی زانیوە بۆیە ئازاد کرا.. جا یان ڕەحمان یان تۆ گەیاندووتانە، پاشا ئەڵێ ڕەحمان بوو.. منیش لە هەڵوێستەدام. (( ڕێشار هەڵئەسێ و کرمانج بە دووایا )) تۆ دانیشە، ئەچم ئاو ئەخۆمەوە. (( کرمانج ترسی لەبەر ئەنیشێت، ڕێشار ئەچێتە ژوورێک و ئەگەڕێتەوە گوریس یان بۆینباخ یان پەتێک لە پشتەوە بە دەستیەوە دیارە، لە پشتەوە ئەیخاتە ملی کرمانج و توندی ئەکا، کرمانج خەریکە بخنکێت و ڕێشار دەستی شل ئەکاتەوە، کرمانج ئەکەوێتە کۆکەی زۆرو سوور هەڵگەڕاوە )) بینیت؟ کوشتنی تۆ لە کوشتنی کرمێک ئاسانترە.. ئەمە تەنها بە گومانێک ئەوەت بەسەرهات.. جا بزانە گەر ناپاکیی بکەیت چی ڕوو ئەدا.

کرمانج (( بەدەم کۆکەوە )): گەورەم بە ژیانت ناپاکیی لە من نابینی دڵنیابە.. بۆ سەلامەتیی کارەکانیشت، من ئاگادار مەکەرەوە لە هیچ شتێک و بمخەرە دەرەوەی بازرگانییەکە.

ڕێشار: نا.. بۆ دڵنیایی زیاتری خۆم، ئەرکێکت پێ ئەسپێرم، نەتوانی لە ژێر ڕکێفم دەرچیت.. با وابێ، جارێ سبەی مەیە لەگەڵمانا.. تا دێمەوەو کارەکەت پێ ئەسپێرم.

Cut

دیمەنی – ٢٨١ – ش/ د – چایخانەی گەڕەک:

(( تایەر ئاسەواری لێدانەکەی پێوە دیارە، لەگەڵ شەماڵ لە چایخانەکە دانیشتوون))

شەماڵ: ئەی خۆ کە لێتگەڕان بێیتەوە لە شوێنێک دایانگرتی، ئەو شوێنە کوێ بوو؟

تایەر: بۆ وا ئەزانی ئەوەندە داماون لەو شوێنە بەرم ئەدەن؟.. چاویان بەستمەوەو بردیانم بۆ دەرەوەی شار، لە دەشتاییەک فڕێیاندام، تا سەیارەیەکم دەستکەوت بێمەوە هەر مردم.

شەماڵ: ئەچینەوە بەر زانکۆکە، سا ئەمە خوایە لەوناوە دەربکەونەوە.

تایەر: چەکیان پێیەو ببێ بەتەقە تیائەچین، پۆلیس و ئاسایشی دنیاش ئەڕژێتە سەرمان.. کێ ئەڵێ خۆشیان شتێک نیین، ئیتر خۆت نازانی؟!!!!!!!!!

شەماڵ: ئەوەش وەزع نییە تۆی تیای، یەعنی گەردنیان ئازاکەین؟

تایەر: ئیتر بزانین مەگەر لە شوێنێکی باش لێمان هەڵکەون!

شەماڵ: ئێ خۆ ئێمە دایمە بەدیار قنگی تۆوە نابین.. بە قسەم بکە من و ئاکارو برزۆو هاوکار لەگەڵت دێین و چەکیش ئەهێنین.. با بزانن ناهێڵین خوێنی ئێمەیان بەسەرەوە بچێ.

تایەر: خۆ خزمانیش زۆریان وا ئەڵێن، بەڵام بەخوا با یەکێکی تیا نەکوژرێ، ئەوە بەکەڵک نایەت.

شەماڵ(( گاڵتە پێ هاتن، ئاماژەی جەستەی تایەر ئەکا)): بۆ ئەمە بە حسابی خۆت هێشتا کەس نەکوژراوە هههە؟

Cut

دیمەنی – ٢٨٢ – ش/ن – ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و دیاری تەمەن نزیکەی ٢٠ ساڵ و ئاکۆی تەمەن نزیکەی ٥٥ ساڵ دانیشتوون))

ئاکۆ: من ئەڵێم جێی خۆمان لەق نەکەین باشترە، لەخوا بەزیاد بێ لەهیچمان کەم نییەو لە زۆر خەڵک باشتر ئەژین.

گێلاس: بەڵێ ئەزانم تۆ پێویستیت بەهیچ نییەو هەر کەڵەکەی ئەکەی لەسەر یەک، بێ ئەوەی بزانین چەندت هەیەو چەندت نییە، ئیتر بۆ بیفرۆشی.

ئاکۆ(( پێکەنین)): ئەم قسانە تازەن گێلاس گیان، ئەگەر حەزت لە پارەیە ئەیخەمە بەردەستت.

گێلاس: ئاکۆ تۆ ژنی خەڵک ئەبینی چۆن ئەژی؟ بە دڵی خۆی بەردەوام لە دەرەوەیەو بە ئارەزووی خۆی ماڵ و سەیارە ئەگۆڕێت و هەر پرسیش بە مێرد ناکا.

ئاکۆ: نارەوەن خان ئەڵێی؟ کێ ناڵێ درۆ ناکا؟

گێلاس: درۆی چی ئەکا پێوەی دیارە بەساقە.. کە خانووەکەت فرۆشت و ئەو باقییە چەورەت وەرگرتەوە، ئەوا هەم خانووی جوانتریشمان ئەبێ و هەم منیش پارەیەکی زۆرم لەبەردەستتا ئەبێ.. کورە خوا ناردویێتی، کێت ئاوا بۆ غافڵ ئەبێ؟ ئەم خانووە لەناو جەرگەی بازاڕیشا بێ ئەوە ناکا.

ئاکۆ: یەعنی لە ئێستاوە داتناوە باقییەکەی بۆ خۆت بێ و بە ئارەزووی دڵی خۆت تەخشان و پەخشانیکەی؟!

گێلاس(( بزە)): ئەی وایە بەقوربان، یەکەمجار هاتوون بۆ لای من هاهاها.

ئاکۆ: ئەی دیار گیان تۆ ئەڵێی چی؟

دیار(( خەریکی مۆبایلە)): خۆتان ئەزانن، کەیفی خۆتانە.

Cut

دیمەنی – ٢٨٣ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای ڕێشار:

(( حەمەخدر دوو کارتۆنی گەورەی بەسەر یەکەوە هەڵگرتووەو ئەیخاتە سەیارەکەی ڕێشارەوە.. لە دیمەنەکەدا: ڕێشارو تافان و بێستان و هەندرێن و سەرەو مالەو کرمانج و خدر هەن))

هەندرێن: گەورەم ئاساییە قەینا، من لای حەمەخدرەوە سەرئەکەوم، دەمە تەقێی خۆشترە، بەخوا لای کچەکان دەمم بۆگەن ئەکا، هیچ ناوترێ.. هههههە.

ڕێشار: ئاخر دوایی گلەیی نەکەی دەم بەگلەیی؟! من پێم وتی لێرە سەرکەوە، خۆت حەزت لای حەماڵەکەیە. دەی هەموو سەرکەون.. کرمانج ئاگات لێرە بێ.

(( هەموو سەرئەکەون و سەرە ئەچێتەوە لای کچەکان و خدرو هەندرێن بە جیاو ڕێشارو مالەش لە سەیارەی ڕێشاردا. ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٢٨٤ – ڕ/ د – بەر ماڵی دارەوان:

(( ئاواو تیرۆژو ئامۆ، بە سەیارەکەی ئاوا ئەڕۆن.. نارەوەنیش پاش کەمێک دوایان ئەکەوێ، دوور بە دوور بە دوایانەوە ئەڕوات))

نارەوەن: ئاخۆ خدر مەبەستی چی بێت؟.. کەس نابینم دوایان کەوتبێت، (( چاو ئەگێڕێ)) ناوەڵا هەست بە هیچ کەس ناکەم.. کچێ ئەو کابرایە شێتە تەواو نییە هههە.. دەی با ئامۆش داگرن، تا زانکۆش ئەچم، با بزانم چ حیکمەتێکی تیایە.. لەوێشەوە بچم بۆ لای تریفەو ئەو پرسیارانەی لێ بکەم کە پێی وتم.. با بزانین جارێ ئەمەیان چی ئەبێ؟

(( گۆرانی حەسەن یرەک هەڵئەکات و دوای سەیارەی ئاوا کەوتووە))

Cut

دیمەنی – ٢٨٥ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان و بروسک دانیشتوون))

بروسک (( بۆ ئەردەڵان)): چییە زلە؟ ئەتەوێ ئیشەکە خۆی بێ بەشوێنتا گەلۆر؟

ئەردەڵان: هەموویان ئەزانن من هەر لێرە دائەنیشم تۆ نەبی.. خۆیان دێن. ئەمڕۆ شوکور یارەکەتانی لێ نییە هەر ئەحەو کارەیە.

بروسک: جا بۆ یاری منە ڕۆڵە؟ تا مامم وەستابێ من حەددم چییە؟

(( پێکەنین))

ئەردەڵان: وەڵا هەر هەمووتان، مامت نەبێ.. ئەو داماوە لە شوێنی خۆی ناجوڵێ، ئەڵێی منە هههە ئەڵێ بچن حەماڵێک بانگکەن و ئێوەش هەمووتان هەر خدرە کەچەڵی بۆ ئەبەن.

بروسک: کورە خدر ڕوحەکەیە.

هاوڕێ: دەی ئەردەڵانە گەلۆر، ئەوە ئەم پیاوەش بە چەند ڕۆژێک ناسیتی.

ئەردەڵان: مامۆستای هەیە، مامۆستا..ئەگینا ئەو چووزانێ؟

هاوڕێ (( گاڵتە پێکردن)): ئا ئا مامۆستای هەیە مامۆستا.

بروسک: دەک سەری لووتت شین بێتەوە ئەردەڵان، سەدی وەک ئەوانە بە شاگردیش ڕاناگرم، ئێستا ئەوان مامۆستامن؟ دەی با پێت بڵێم، سەرباری هەموو عەیبەو نەنگییەکەشت مێشکە کاڵەکەشت باش پێ نەگەیشتووە، ئاوی بە ئاو هههە

ئەردەڵان: وەڵاهی من هەموو ئەوانیتر لە تۆ بە باشتر ئەزانم بە خدرە کەچەڵیشەوە، ئەوان هەر ئیشم نادەنێ و پشتگوێم ئەخەن، بەس تۆ سوکایەتیشم پێ ئەکەی.. بە ڕاستیی قسەتم زۆر لەبەردڵ گرانە.

بروسک: ئەوە چییە کردت بە ڕاست؟ (( هەڵئەسێت و ئەچێتە لایەوەو سەری ماچ ئەکا)) کورە قوربانت، هەستە ئیشت پێ بکەم، هەستە هههە ______ Cut ______

دیمەنی – ٢٨٦ – ڕ- عەسری درەنگ/ د – سەر جادەی دەرەوە:

(( ڕێشار سەیارەکان ڕائەگرێت و ئەچێتە لای سەیارەی کچەکانەوە.. دەرگا ئەکاتەوە ))

ڕێشار: ببورن سەیرێکی دیارییەکانتان ئەکەمەوە، نەک وەک جاری پێشوو بێت، بەخوا خراپ بێ ئیتر لەو قەزایە بێت و من یەک دیاریتان بۆ هەڵناگرم.

بێستان: بەخوا پێویست بەو عەزێتە ناکا کاک ڕێشار.

تافان: بە دڵی خۆت.

(( ڕێشار کەمێک خۆی بە دیارییەکانەوە خەریک ئەکات و ئەگەڕێتەوە لایان))

ڕێشار: نا بابە پیاوی نەجیب شتی خراپمان ناداتێ.. بۆکسێکی گوڵە، پیاو دڵی نایەت تەماشایکا.. کە چووینەوە سوپاسێکی گەرمی ئەکەم، دەی ئێوەش پیرۆزتان بێ.

(( سەیارەکان ئەکەونەوە ڕێ))

Cut

دیمەنی – ٢٨٧ – ش / د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن جلی ماڵەوەی لەبەردایە، تراکسوت و ڕۆبێک بەسەریا ))

خدر (( دەنگ)): ئەگەر ئەتوانی بە بیانوویەکەوە بێیت، ئەمشەو وەرە بۆ ئێرە، ئەگەر نا بەیانی لە هەر شوێنێک بێ یەکتر ئەبینین.

نارەوەن: با بزانم کچەکە قەناعەت ئەکاو ناترسێ؟

خدر: دەی باشە ئاگادارم بکەرەوە.

نارەوەن: باشە چاوەکەم.

تیرۆژ (( دێتە دەرەوە)): ئەرێ ئەوە بەم سەرمایە لە دەرەوەی قسە لەگەڵ کێیا ئەکەی؟

نارەوەن: ئەوە چییە تیرۆژ خان؟ جا بۆ تێڵایەکیشمان لێ هەڵناگری؟ نونەی پورە ناجی هاوڕێم بوو، مناڵەکەی هەڵخلیسکاوە قاچی لە جێچووە، وتم ئەگەر تیرۆژ هات لەگەڵما ئەوە دێین.

تیرۆژ: ئەی نازانی من حەزم بە چارەی نییە؟ نەوەڵا خۆت بڕۆ.

نارەوەن: ئەی تۆ چۆن بە تەنیا بەجێبێڵم؟ ناترسی؟

تیرۆژ: نا خۆتان کلیلتان پێیەو منیش دەرگا لە هیچ کەس ناکەمەوە.

نارەوەن: دەی باشە، ئا ئەو سویچەم بدەرێ و بچۆرەوە ژوورەوە.

تیرۆژ: هەر بەو جلانەوە؟

نارەوەن: ئەی چی تۆزێکم پێ ئەچێ، خۆ داینا کوتم لەوێ.

(( تیرۆژ سویچی بۆ ئەهێنێت و نارەوەن پێی ئەڵێ ئاگای لە خۆی بێ و خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ٢٨٨ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج لە ژوورەوە دانیشتوون))

ڕێشار: سبەی یەکێک بێنە ئەو فەرشە فرێدات و دانەیەکی تازەی بۆ بکڕە با ڕایخات.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم، چ ڕەنگ بێت؟

ڕێشار: من کەی گوێم بە ڕەنگداوە، فەرش بێت و تەواو.

کرمانج: بەڵێ بەسەرچاو.

ڕێشار: کرمانج سبەی شەو لەگەڵ سەرەو ماڵە ئەچن کەسێکم بۆ ئەکوژن.

کرمانج: بەس بۆ ئەوەی جەنابت دڵت لێم پاک بێتەوە، بێ ئەوەی بپرسم کێیە، خۆم ئەیکوژم.

ڕێشار: ئەگەر دارەوان بێت؟ یان زوبێر.

کرمانج: ئەوە نایخەمە سبەی شەو و سەرەو ماڵەشم ناوێ، تەنها خۆت وەرە ببینە چۆن ئەیانکوژم و بەس.

ڕێشار: من هیچ گومانم لە تۆو لە دڵسۆزییەکەت نییە کرمانج.. (( زەنگی مۆبایل)) بەڵێ پاشا گیان....... زۆر سوپاس دەستت ماچ ئەکەم ............... بەڵێ وەک جەنابت فەرمووت ئەوەم کرد، دیارییەکەم گۆڕی بە گوڵ و لە نزیکی شاریش ئۆکەیم بۆ کردن بۆ خۆیان بێت.......... نا نا پاشا گیان، هیچ شتێک بێ فەرمایشتی خۆت ناکرێ........ دەستت خۆش بێ، زۆر بیرم لەم پلانە کردەوەو سات بەسات زیاتر پێت سەرسام ئەبووم......... نا کرمانجیشم نەبرد.......... دەستت ماچ ئەکەم پاشا گیان...... خواحافیز.

ڕێشار: خۆ گوێت لێ بوو بە فەرمانی پاشا نەهاتی، نەک لەبەر ئەوەی من گومانت لێ ئەکەم.

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٢٨٩ – ش/ن –ماڵی خدر:

(( نارەوەن لەسەر لایەکی سیسەمەکە دانیشتووە، خدر چا تێ ئەکا، هەردووکیان تراکسودیان لەبەردایە))

نارەوەن: ژوورەکەت زۆر گەرمە خدر خراپە نەخۆش ئەکەوی، ئەها هەموو گیانم ئارەقەیە.

خدر: تۆ با چایەکیش بخۆینەوەو هەواڵم بدەرێ چیت کرد؟

نارەوەن: ڕۆڵە تۆزێک ژوورەکە ڕێکخە، ژووری نوستن و میوان ئاخر چۆن بە یەکەوە ئەبێ.. ئەم سیسەمەت بفرۆشەوە، ئەمڕۆ ژوورێکی نوستنی تاقمم بۆ کڕیویت، بەیانی بچۆ بیهێنەرەوەو بیبە ژوورەکەی ئەوسەر، تاقمێک قەنەفەشم بۆ کڕیویت، ئەویش بهێنەرەوە. ئەویان بە مێزو تەپڵەکیەوە لێرە دابنێ.

خدر: تۆ ئەتەوێ خۆم بکوژم؟ بۆ وا ئەکەی؟ بەسەری تۆ پارەم هەیەو خۆم نەمویستووە بیکڕم.. ئەڵێم ئەو هەموو مەسرەفە بۆ تەنها کەسێک بۆ؟

نارەوەن: میوان ڕووت تێ ئەکا، ئەمە ماڵی خەڵکی شار نییە باوانم.

خدر: گەورەبیت نواند، دەستت ماچ ئەکەم..(( سەیری چایەکەی ئەکا)) چاکەت سارد ئەبێتەوە.

نارەوەن: کچەکەم بە تەنها جێهێشتووە نەک نەگبەتیی من یەکێکیشیان زوو بگەڕێتەوە، با قسەکانت بۆ بکەم و بڕۆم.

خدر: زۆر باشە، ئەرەوەڵڵا تا ئەکرێ زووتر بڕۆی.

نارەوەن (( پێکەنین)): زووتر بڕۆم ها؟!!!!

خدر: تکایە مەبەستم نەبوو.

نارەوەن: قوربان لە تاوا خۆم بەو شت کڕینانەوە خەریک کرد، تۆ لێرە نەبووی، مێشکم خەریک بوو ئەتەقی، کێشەکان زۆر قوڵ بوونەوە.

خدر: ئادەی بزانم؟

نارەوەن: تریفە ئاگاداری هیچ نییە لەو ئاوەو باوکی پێی وتووە خۆت مەچۆ، هەر ئەو دوو کرێکارە بنێرە، لە کۆمپانیایەکی ئاوی برادەرم بۆت بێنن، زۆر بە هەرزانتر.

خدر: ئۆو ئۆو مام دارەوان! ئێ؟؟؟

نارەوەن: کچە ئەڵێ خۆی دوو کرێکارەکەی بۆ دامەزراندووم و ئاگام لە هیچ نییە، تەنها من و هەڵشۆ ئەوەمان لەسەرە، بە نیوە قیمەتی بازاڕ پارەیان ئەدەینێ.

خدر: کەواتە دارەوان و ڕێشار وا نیین کە خەڵک ئەیبینێ؟

نارەوەن: نازانم؟! دنیام لەبەرچاو کەوتووە، سیقەم بە تۆ نەبێ، بەیەک کەس نەماوە.

خدر: نا نا وا مەبە.. ئەوە دەرکەوت تریفەی داماو ئاگای لە هیچ نییە، دڵنیابە منداڵەکانیتریش لە گوڵ پاکترن.. بەڵام ئەوەی سەیرە کاک دارەوانە، چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕێشارا ئەکا؟ ئەمەیان شتێکە ئەقڵ نایبڕێ، هەموو خەڵك ئەزانن ئەو دووە شیرو تیر لە یەک ئەسوون.. ئەوە دڵنیاشم ئەمڕۆ تیرۆژ کەس دوای نەکەوتووە.

نارەوەن: بە چی دڵنیای؟

خدر: لەبەرئەوەی ئەو دووەی ڕۆژانە بەدوایەوەن، ئەمڕۆ لەگەڵ ئێمە بوون.. تۆ سبەینێش دوایان بکەوە (( لە مۆبایلەکەیدا ڕەسمی سەرەوماڵەی تیایە، نیشانی نارەوەنی ئەدا )) ئەگەر سبەی چوویت و ئەم دوو دەموو چاوەت لەو دەوروبەرە بینی، کەواتە ئیشەکەمان ئاسانە، گەر نەیانبینی، واتە شتێکی تەمومژاویی هەیەو ئەبێ بیدۆزینەوە.

نارەوەن: لەو بڕوایەدای شتێکمان دەستکەوێ؟

خدر: شتی زۆر ڕوویداوە، خزمەتکارەکەی ڕێشاریش دوێنێ شەو کوژراوە.. تۆ با دوا نەکەوی، خەریکە دارەوان لام ببێتە جێی مەترسی، خۆ بزانێ دێیت بۆ لام، گۆشتاو گۆشت سەرمان ئەبڕێ.

نارەوەن: نا.. نا ئەوە نییە، دەمێکە لەگەڵیام باشی ئەناسم.

خدر: پیاو ڕوون نییە نارە خان گیان.. هەستەو بڕۆ، خۆ کە من و تۆ دائەنیشین کات خۆی ئەشارێتەوە.

نارەوەن: بۆ؟

خدر: ئەڵێ نەک بمکوژن هەههە

(( پێکەنین و چا خواردنەوە تەواو ئەبێت و هەستانی نارەوەن و بە پێوە ئەوەستن و قسە ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٢٩٠ – ش/ د – بەردەمی پارکێک:

(( ڕێژوان و ڕۆستەم و سالم وەستاون.. ))

سالم: کاکە ئەم نامەیەمان بۆ بگەیەنە دەست مامۆستا.

ڕێژوان (( نامەکە هەڵئەگرێ)): باشە بەسەرچاو، سبەینێ ئەیدەمێ.

(( ڕێژوان ئەڕوات و سالم و ڕۆستەمیش پیاسە ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٢٩١ – ش/د – بەردەمی ماڵی دارەوان:

(( لۆرییەک لەبەر ماڵی گێلاس وەستاوەو دوو کرێکار قەنەفەو دۆڵاب ئەخەنە لۆرییەکەوە.. گێلاسیش شتی بەدەستەوەیە بیهێنێتە دەرەوە، پاش کەمێک نارەوەن هەر بە جلەکانی دیمەنی – ٢٨٩- ەوە بە سەیارەکەی دێتەوە، دوای سڵاو))

نارەوەن: ئەوە چییە گێلاس؟

گێلاس: بڵێم چی نارەوەن خان؟ ئاکۆ خانووەکەی گۆڕیوەتەوە بە مەرجی ئەوەی هەر ئەمشەو تا سبەی سەعات ١٠ بۆی چۆڵکەین، وا خۆیشی لەگەڵ لۆرییەکەی تر ڕۆشتوەو داماو داماو هەر خۆم ماومەتەوە.

نارەوەن: بەم کتوپڕییە؟

گێلاس: ئاخر فرسەت بوو نارەوەن خان، کابرا باقیەکی چەوریشی داوەتەوە بە ئاکۆ، بۆ ئێمە زۆر باشە.. وتوویەتی ئەمڕۆ چۆڵی نەکەی نامەوێ.

نارەوەن: ئەی کابرا کێیە، ساوەڵڵا زۆرم پێ ناخۆشە.

گێلاس: بێدەنگن، هەر ژن و مێردێک و برایەکی مێردەکەیە، گەنجن.. ئەها ئەوەی ئەو ڕۆژە وتمان زۆر بەمناوەدا دێن و ئەچن؟! تومەس بۆ خانوویەکی باش گەڕاون بۆیان دەست بدا، خۆی وتی زۆر دەمێکە بەم گەڕەکەیا دێین و ئەچین تا ئەو خانووەی تۆمان هەڵبژاردووە.

نارەوەن: وەڵا هەر تاسام، بە ڕاستی هەواڵێکی ناخۆشت دامێ، ئاخر چۆن بیهێنمە پێشچاوی خۆم، تۆ لەم گەڕەکەدا نەبی، کچێ ئەزانی چەندساڵە دراوسێین.

گێلاس: ئیتر قسمەتەکە وابوو، خۆ پێ لە یەک نابڕین، بەخوا بەخوا هەر سەردانت ئەکەم و تۆش ئەبێ هەر بێی.

نارەوەن: کچێ وەی بەسەرچاوم، ئەوە قسەیە؟ چۆن بێ تۆ ئەژیم گێلاس گیان؟

(( لەمیوتیدا باوەش بەیەکا کردن و ماچکردنی یەک و نارەوەن بەرەو ماڵی خۆی))

نارەوەن(( لەبەر خۆیەوە)): جا کە خوا ناردی، ناپرسێ کچی کێیی.

(( دەرگا بە کلیل ئەکاتەوەو ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٢٩٢ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆ لە جێی خۆی و ڕاهۆز بە پێوە لە بەردەمیا وەستاوە))

ڕاهۆز: گەورەم دوا نامەی نوسیویەتی، ئەڵێ لێمگەڕێن تا خۆم ئاگادارتان ئەکەمەوە، مەترسیی زۆرە. تەتەرەکە بۆی هێنام بۆماڵەوەو هیچ نەوەستا.

سەرکۆ: ئەی نازانێ بەوە لە هەموو هەواڵێک دائەبڕێی؟

ڕاهۆز: دیارە مەترسییەکەی لەوە گەورەترە، بەڵام ئەڵێ خۆم ئاگادارتان ئەکەمەوە.

سەرکۆ: بەدوای جێگرەوەکەیدا بگەڕێ.

ڕاهۆز: کەس شک نابەم گەورەم.

سەرکۆ: ئەی ئەو ژنەکەی خۆی هات، پەیوەندیی کرد چۆنە؟

ڕاهۆز: گەورەم دوو ڕۆژە ئەویش دەنگی نییە.

سەرکۆ: سەیرە.. تۆ ئەتوانی پەیوەندیی پێوە بکەی؟

ڕاهۆز: گەورەم ئەی ڕەنگە باش نەبێت، مێردو مناڵی هەیە.

سەرکۆ: ناچارییە، باشترین کەسەو گومانی لەسەر نییە، پێی بڵێ خۆی لەو ئاشکرا بکات و ئیتر پۆستی هەردووکیان لە ڕێگەی ئەو ژنەوە بگاتە دەستت..

ڕاهۆز: گەورەم ئەو ژنەو ناکرێ بێت بۆ ماڵی ئێمە، منیش لە دەرەوە زۆر ناسراوم ناتوانم لە شوێنی گشتی بیبینم.

سەرکۆ: با بیداتە گەصەکەی "باراناو" و تۆش لەوی وەربگری.. ئەوەی تێ بگەیەنە.

ڕاهۆز: ئەو ژنە زۆر کراوەیە گەورەم، با بزانم خۆی ئەڵێ چی، دواتر پرست پێ ئەکەمەوە.

(( تحیة و هاتنە دەرەوەی ڕاهۆز)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٢٩٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان و بروسک و زوبێر دانیشتوون))

زوبێر: ئەگەر دەرفەتتان بوو خۆت و نارەوەن و کچەکەش بهێنن! پێمخۆشە.

دارەوان: جا دەرفەتیش نەبێ زوبێر، هەر ئەبێ بێین، ڕێژوان کوڕی خۆمانە.

زوبێر: سوپاس هەر ئەوەت لێ ڕائەبینم، بەڵام بۆ ئەوەی چیمەن زروفەکەی جیاواز بوو بۆیە ئاگادارم نەکردنەوە، هەر کەس کەسمان بانگ نەکرد، تەنها خێزانی هەردوولاو کەسیتر.

بروسک: بەڵام مامە دارەوان دیارییەکی گەورەی پێ بەخشین.

زوبێر: ئاگادارم.. پێی ئەزانم، سوپاسم کرد.. خۆ ئەمجارەش ماڵەکە هەر لە پرسەدان جارێ، بەڵام هەر ئەو شەوە تێگەیشتم کچەکەیان لێ تەوقە، بۆیە زۆرم پێ باش بوو بروسک خێرا دەستپێشخەریی کرد.

بروسک: لە جەنابتەوە فێر بووین مامە گیان.

دارەوان: لەبەرئەوە هەر قەرەباڵغیی نەکەین باشترە، شوێنەکەشیان ڕەنگە ئەوە نەبێت.

زوبێر: زۆر ڕاستە.

دارەوان: دە وەڵڵا من بە نارەوەن ناڵێم، هەر نەیەت باشترە.

زوبێر: بە دڵی خۆت، ئەگەر بشیەت خۆ ئاساییە.

دارەوان: نا نا با قەرەباڵغیان لەسەر دروست نەکەین.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٢٩٤ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( سەلوا باڵاو کڵپە ئەگۆڕێ))

سەلوا: یاڵڵا دەی ی ی ی .. ئاواهی، دەی قۆڵەکەی تریشت، ئادەی.. ئافەرین.

باڵا (( پێکەنین)): زۆر خۆش ئەمانگۆڕی، وەڵا دایکم ئەگەر جلەکەش بچوک بێ، بە زۆر ئەیکاتە بەرمان هههه.

سەلوا: نا دایکتان ئێوەی زۆر خۆش ئەوێ.

باڵا: ئێ ئەزانم، هەر لە جلگۆڕینا تووڕە ئەبێ.

کڵپە: وەڵا تورە نابێ، بۆ درۆ ئەکەی؟

باڵا: وەڵا لە من تووڕە ئەبێ درۆزن.

سەلوا: دەی با نەیکەین بە هەرا.. ئینجا سەرەی کڵپەیە، ئادەی بۆم وەرە پێشەوە قسە زل.

(( کڵپە ڕائەکات و سەلواو باڵاش بۆ یاریی بەدوایا ڕائەکەن))

Cut

دیمەنی – ٢٩٥ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن لە حەوشە وەستاوەو مۆبایلی بە دەستەوەیە))

نارەوەن (( دڵەڕاوکێ و ترس)): ئەی چۆن بیبینم.

خدر ((دەنگ )): وەرە حەوشە. خۆ کەسی لێ نییە؟

نارەوەن: هاتووم. نا نا کەسی لێ نییە.

خدر: ئێستا لە دەرگا ئەداو لێی بکەرەوە، پیاوێکە سەکسوکی هەیە.. دەی من خواحافیز.

نارەوەن: خواحافیز بەساقەوبم زۆر سوپاس.

(( لە دەرگا ئەدرێت.. نارەوەن ئەچێ ئەیکاتەوە، خدر٢ بە کەسێتیی دووەمی، دەنگی خۆی ئەگۆڕێ لەبەردەرگایە، بە هەمان قات و بۆینباخەوە.. نارەوەن فەرمووی زۆری لێ ئەکا بۆ ماڵەوەو خۆشحاڵیی خۆی بۆ دەرئەبڕێ))

نارەوەن: ئاخر ناکرێ هەر لە دەرگاوە، تۆ فەرموو.

((خدر٢و نارەوەن پێکەوە دێنە حەوشەکەو لە مەدخەلەوە ئەچنە ژوورەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٢٩٦ – متبوع - ڕ/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن بە شەرم و ترس و خۆشحاڵییەوە پێشوازیی ئەکا، لەگەڵ خدر٢ دێنە ژوورەوە))

نارەوەن: نازانم چۆن سوپاسی ئەو چاکە گەورەیەت بکەم کە لەگەڵت کردین.. بەڕاستی تۆ نمونەی میهرەبانترین فریشتەیت.

خدر٢: هیچم نەکردووە نارەوەن خان، ئەوی تۆ بناسێ کە چەند کەسێکی باشیت، زۆر زیاترت بۆ ئەکا.

نارەوەن: جا چاکە لەوە گەورەترو باشتر؟

خدر٢: لە ئاستی تۆدا زۆر کەمە.

نارەوەن(( زۆر دیقەتی ئەدا)): ئەرێ وەک بتناسم وایە؟! یان بە هەڵەدا چووم؟

خدر٢(( پێکەنینی کەم)): نا بە هەڵەدا نەچوویت.

نارەوەن: بەخوا خەندەکەشت نامۆ نییە بە من.

خدر٢: حەز ئەکەی بزانی من کێم؟

نارەوەن: هەر زۆریش.

((خدر دەست ئەبا بۆ سمێڵی لێی بکاتەوە))

# (( ئەڵقەی پانزە))

(( خدر تەواوی سەرو برۆو ڕیش و سمێڵی لێ ئەکاتەوە، نارەوەن زۆر ئەحەپەسێ))

نارەوەن: خخخخخ در.. ئەوە تۆی ماڵەکەم؟ تۆ کچەکەت ڕزگار کرد؟

خدر: ئەی چۆن؟ چۆن ئەهێڵم تۆ ئازار بچێژی، تریفە خوشکی منیشە.

نارەوەن(( ئەگری، هەردوو دەستی ئەگرێ بە دەموچاویەوە)): بە قوربانت بم خدر گیان، زۆر سوپاس، جا گەر تۆم نەبوویتایە چیم بکردایە؟

خدر: وا منت هەم و زۆر بێخەمبە نارە گیان.. (( بەزۆر هەردوو دەستی لە دەموچاوی ئەکاتەوەو ناهێڵێ بیباتەوە بۆ دەموچاوی)) مەگری..بەسە ئیتر.. گرنگ ئەوەیە ناهێڵم مێشوولەش بەلاتا بێ و زیانت پێ بگەیەنێ.

نارەوەن: کورە بەساقەوبم، ئاخر چۆن بە هەموو دنیا نەڵێم خدر فریامان کەوتووە؟ چۆن دنیا تێ نەگەیەنم؟ (( هەڵئەسنە سەرپێ و نارەوەن سەر ئەخاتە سەر شانی))

خدر: ئێمە بڕیارماندا هەموو شتێ نهێنیی بێت نارە خان گیان، نێوانی من و تۆ هەرکەس بیزانێ، هەرکەس بزانێ چۆن من دنیا ئەگەڕێم بۆ ئەوەی هەواڵێکت بدەمێ، هەر کاک دارەوان و کاک زوبێرو ڕێشار ئەنجن ئەنجنم ئەکەن.. بێدەنگ بەو بە هیچ کەسێکیش ناڵێی، ئەگینا پێت ئەڵێن تۆ چۆن ئەوت دۆزییەوە؟

نارەوەن (( بەدەم فینگە فینگەوەسەری لەسەر شانی لائەبا)): نا نا بەکەس ناڵێم من کەسی باشی وەکو حمە خدرم هەیە.. نازانم بە چی و چۆن بتوانم ئەم چاکەیەت بدەمەوە؟

خدر(( سەروریش و سمێڵەکەی دائەنێتەوە)): بە پێچەوانەوە من قەرزاری تۆم، تۆ ئەزانی چەندجار فریام کەوتووی؟ ئەها چ پیاوێکم لە سایەی تۆوە؟.. خۆت نازانی.. بەس من بەردەوام منەتبارت بووم، تۆ بەردەوام گەورەترین و میهرەبانترین و باشترین دایک بوویت و جوانترین دڵت بەخشیوە.

نارەوەن: کورە دڵ چییە خدر گیان؟ تۆ کچەکەت لە کوشتن ڕزگار کردووم. تۆ ڕێت لە گەورەترین تێکشکانی ئەم خێزانە گرت.

خدر: کاتی قسەمان نییە نارەخان گیان، نەک یەکێکیان بێنەوە، من ئەڕۆم (( هەڵئەسێ))

نارەوەن: دڵنیابە هەموو گریانەکەشم لە خۆشیا بوو.

خدر: تۆ بڵێی نەزانم؟.. ئەزانم.. دەی لەسەر ئیزنی تۆ، ئەبێ بڕۆم، خواحافیز.

نارەوەن (( گریان و پێکەنین تێکەڵ)): دەعوەتی ماسیەکەش هەر بەم جلانەوە بێی، ئەچینە شوێنی ڕاقی.

خدر: دەست لە هەموو شتێک هەڵگرم دەعوەتەکە نا هههه

نارەوەن: قسەمان زۆرە، ئەملاولاشی تێکەوت.

خدر: هەر زۆر زۆریش.. ئەگەر شەو دەرفەتت بوو، یان عەسر، پەیوەندیمان ئەبێت.

(( نارەوەن جلەکانی خدر ئەتەکێنێ لە کاتی چوونە دەرەوەداو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ٢٩٧ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج))

کرمانج: ئەگەر ئەوە بکەی باشترە گەورەم.

ڕێشار: بیرم لە شتێکی وا کردۆتەوە.. هەر ئەمجارە کچەکان ئەبەینەوە بۆ مەرزو دوای ئەوە دەریان ئەکەم.. ڕاستە با زۆر لێرە نەمێننەوە. بۆ حەماڵیش ڕاستە بەڵام کەسیان وەک ئەو کابرایە گورج و گۆڵ نیین، چیان لێ بکەم؟

کرمانج: دەی گەورەم وا شارەزای ئەمناوە بووە، لای جەنابت و کچەکان نەبێ، لە هەموو ژوورێک دائەنیشێت.

ڕێشار: لای خۆشت؟

کرمانج: ئەرەوەڵا کە پاڵی لێ ئەداتەوە، ئەڵێی بە لەزگە بە کورسییەکەوە چەسپ کراوە، هەستانی هەر نییە، ئیتر منیش لە ڕووا دائەمێنم.

ڕێشار: هیچ لە ڕووا دامەمێنە، لەمەودوا تۆ دەوڵەمەند ئەبیت، پڕ ئەبیت لە نهێنیی دەوڵەمەند بوونەکەت، چۆن ئەبێ پاتاڵی وا ئاگای لە نهێنییەکانت بێ؟ هەر کە هات دەریکە، با وردە وردە فێربێ نەیەتەوە لای تۆ.

کرمانج: زۆر باشە.. پێی ئەڵێم ئەگەر ئیشم هەبوو زانیت خەریکم، بێ ئەوەی پێت بڵێم، خۆت نەیەیتە ژوورەوە، بەخوا لەوە زیاتر ڕووم نایەت..

ڕێشار: خەمت نەبێ، خۆم پێی ئەڵێم نەیەت بەلای ژوورەکەتا تا خۆت بانگی نەکەی.

کرمانج: ئەرەوەڵا زەحمەت نەبێ بڵێ کە بانگیشی کردی داینەکوتی، بەقەدەر ئیشەکە بمێنەرەوە.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٢٩٨ – ڕ/ د – بەردەمی چاپخانەکە:

(( زوبێر لەگەڵ ڕێژوان وەستاون و بروسک لە چاپخانەکە دێتە دەرەوە ))

بروسک: ئەڵێن ئەمڕۆ تەنک دەرکەوتووە، لەوێ نەبوو.

زوبێر: دەی کێشە نییە، لەوێش حەماڵمان دەست ئەکەوێ.

بروسک: دە با من بچم مامە! تۆ ماندوو ئەبیت.

زوبێر: نا کورم ڕێژە گیان یەک جار ژن ئەهێنێ، ناهێڵم بیکا بە دوو هههە.

ڕێژوان: هەر یەکجار بەڵێ.

زوبێر: دەی کەواتە خۆم ئەچم دەستودیاریی ماڵە خەزورانی بۆ هەڵئەبژێرم.

بروسک: جا خۆ جارێ هیچ نەکراوە مامە گوڵ؟ بۆ ئەوەیان ناخەیتە دوایی؟

زوبێر: نا هەر خۆم بەڵێنم دابوو لە شیرینیی هەڵگرتنەکەی ڕۆژی داواکردنەوە، تا مانگی هەنگوینییەکەیان، هەرچی شتێ بکرێ، ئەبێ دەستێکی منی تیابێ.

ڕێژوان: قوربانت بم باوە گیان.

زوبێر: نا کورم ئەوە شتێکی زۆر دانسقە نییە، هەموو باوکێک لەو سیفەتەیا هاوبەشن.. ڕاستە تۆ لە ڕووی فیزیکییەوە ئۆرگانێکی جەستەی من نیت.. بەڵام ئیتر باوک وا ئەزانێ لە خۆی بۆتەوە، چاوی لەسەر هەر جموجووڵ و هەناسەو ترپەیەکی دڵیشتە.. ئا.. زەحمەتە ئەو باوکانەی منالێکیان لەدەست ئەدەن، بگەڕێنەوە ژیانی ئاسایی خۆیان.

بروسک: زۆر ڕاستە.

زوبێر: کەواتە با پێ هەڵگرین، بە هۆی خدرەوە نەبووایە، حەوت زەمان بوو هەموو شتێکمان کڕیبوو.

بروسک: منیش لەفەیەک ئەخۆم و ئەگەڕێمەوە کۆمپانیا.

ڕێژوان: چاک بەو شفتەیەی هاوڕێ فێر بوویت؟

زوبێر: ئۆو ساختەچییانە شفتەش هەیەو بە منی نالێن؟

بروسک: وتم ڕەنگە تۆ خواردنی ئەمجۆرە شوێنانە نەخۆی؟

زوبێر: جا کە تۆو ڕێژوان بیخۆن، من چیم لە ئێوە زیاترە؟

ڕێژوان: دەی کەواتە پێی بڵێ بۆمان هەڵگرێ، نان ناخۆین و دێینەوە بۆ شفتەکە.

بروسك: خەمتان نەبێ.

(( ئەوان ئەڕۆن و بروسک ئەچێتە چایخانەکەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٢٩٩ – متبوع – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان و چەند کەسێک دانیشتوون.. بروسک دێت و سڵاو و وەڵامدانەوە.. پاش کەمێک تایەرو ئاکار دێن، سڵاو و وەڵام))

تایەر: ئەڵێن شفتەیەکی خۆشی هەیە، ئەگەر وابێ خۆ ئێمە زۆر دوور نیین، هەموو ڕۆژێک دێینە ئێرە.

ئاکار: چۆن دوور نییە، وەڵا دوورە، بە سەیارەکە نەبووایە ڕۆژە ڕێیەکە.

هاوڕێ: فەرموون برا.

تایەر (( بۆ ئاکار)): با تاقی بکەینەوە! کاکە دووقاپ شفتەمان بەرێ.

هاوڕێ: ئاخر بە قاپ چۆن؟ من هەر بە لەفە ئەیفرۆشم.

تایەر: هەریەکەو بایی ٤ لەفە شفتەمان بۆ بخەرە سەرقاپێک و تەماتەو خەیارو سەوزەکەشی جیاکەرەوە.

بروسک: قسەکەیان جوانە، بۆ منیشی هەروا لێبکە.

تایەر: ئەی وا نییە؟

بروسک: زۆر ڕاستە، من عەسران دێمە ئێرە لەفەیەک ئەخۆم، چاک بەردڵ ئەگرێ و تامەکەشی زۆر نایابە.

تایەر: ڕەنگە بۆ تۆ ئاسان بێ، بەس بۆ ئێمە دوورین، وەک ئاکاری برادەرم وتی بە سەیارە نەبێ ڕۆژە ڕێیەکە، بەس تۆ دیارە لەم گوزەرەی، یان دوور نیت؟

بروسک: نەوەڵا هەر قادرمەکانەو هیچیتر، پێچ ئەکەمەوە خۆیەتی.

کرمانج(( لە کاتی قسەکانی بروسکدا کرمانج دێت و بۆ ئەردەڵان)): هەستە وەرە ئیشم پێتە.

(( تایەر لەگەڵ ئاکار سەرقاڵەو بە تیلەچاو کرمانج ئەبینێ))

تایەر(( بۆ کرمانج)): بۆ نافەرمووی نانێک بخۆی؟

کرمانج (( ئەیبینێ ئەشڵەژێ)): لەگەڵ منت بوو؟

تایەر: ئەی لەگەڵ کێمە ڕەزاقورس! (( هەڵئەسێتە سەرپێ و بروسک لە لاوە دەستی ئەگرێ و دایئەنیشێنێتەوە)) بۆ وات ئەزانی ناتاندۆزمەوە؟

کرمانج (( تورە)): تۆ کێی هەتیو؟ چۆن من ئەناسی؟

تایەر: ئەوە بیرت چووەوە؟ ئەی دوای لێدانەکە تۆ نەهاتی یەک دنیا پرسیارت لێکردم ئەتوت لە دایەرەی ئەمنی سەدامای؟

کرمانج: نا بەهەڵەیا چوویت، لێت تێکچووە، نازانم باسی چی ئەکەیت و لە خۆتەوە هەڵەش نەکەیت (( دوو کەسی نادیار دێن و بە زۆر باڵبەستی ئەکەن و ئەیبەن.. ئاکار ڕائەکا.. کرمانج و بروسک زۆریان پێ سەیر ئەبێ))

بروسک (( پێکەنین)): بەخوا ئازا بوون هههە.

هاوڕێ (( دەستی بەیەکا ئەدا)) ئای خوایە هەر خۆم لە دەنگە دەنگ ئەپارێزم!!

(( خەڵکەکە پێیان سەیر ئەبێت و کرمانجیش ئەڕوا، بروسک بە پێکەنینەوە داوای نان ئەکاتەوە دووبارە))

بروسک: ئا لەو خواردنەم بەرێ کە کابرا شەقی لەسەر خوارد!

ـــــــــــ تابع ـــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٣٠٠ – متبوع – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار تەلەفون ئەکاو گرژە، پاش کەمێک کرمانج دێتە ژوورەوە))

ڕێشار: بۆ باوکیشی ئاقڵکەن، وای لێ بکەن، جارێکتر نەخڵەتابێ بێتە سەرڕێی پیاوی من.. باشە بیبەن لەوێ تێیهەڵدەن....... ئا ئا بیکەن بەساقەی مردنێک.. (( مۆبایل دائەخاتەوەو کرمانج دێتە ژوورەوە)) ئەوە چ خوێڕییەک هاتۆتە سەرڕێت؟

کرمانج: ئەوی جاری پێشوو لەسەر کچەکەی دارەوان سەرەو مالە لێیاندا، لە چاخانەکە بوو و منی ناسییەوە.

ڕێشار: کەواتە شوێنمان کەوتووە؟

کرمانج: باوەڕ ناکەم، ڕەنگە ڕێکەوت بێ.. لەگەڵ یەکێکیترا بوو، ئەو هەر زۆر زوو ڕایکرد.

ڕێشار: باشە پێیان ئەڵێم چۆن تەڵقینی دابەن.. بە کچەکانت وت؟

کرمانج: ئەم بەزمە بیری بردمەوە، وا ئەچم.

ـــــــــــ تابع ـــــــــــ Cut ـــــــــــ

دیمەنی – ٣٠١ – متبوع – ڕ/ن – ژووری کچەکان:

(( هەندرێن و بێستان و تافان وەک ماندوو پاڵیانداوەتەوە ))

بێستان: جا کەوایە هەرسێکمان بچین و پێی بڵێین ئیتر تاقەتمان چوو وازئەهێنین.

تافان: ئەشهەدو بیللا.

هەندرێن: پەلە مەکەن، هەرئاوا هەفتەیەکیتر، ڕەنگە ئیش بۆ تۆش بدۆزینەوە بێستان خان.

بێستان: باوەڕ بکە ئەم شوێنە هەرچی ئیشە لەبەرچاوی خستووم، ئەگەر بچووکترین ئیشم دەستکەوێ و مەمرەوبژی بتوانم ماڵی باوکمی پێ بژێنم، یەک دەقە لێرە نەئەمامەوە.. ئیشێکی بچووک، لێی دڵنیا بیت و ئەم دیاریی و دیارییکارییەی تێ نەکەوێت و کەس پەنجەت بۆ درێژ نەکا.

هەندرێن: ئەچیتە کۆمپانیایتر چونکە کاریان گەن نییە، موچەیەکی کەمت بۆ پێشنیاز ئەکەن.. ئەمانیش هەهە هەهە

بێستان: ئەیانەوێ بەمدەست و بەودەست پارەت بدەنێ.. ئاخر بۆ؟ زۆر ئاڵۆزە ئیشی ئێرە.

کرمانج (( دێتە ژوورەوەو پاش سڵاو و وەڵام)): دوو بەیانی ئەچینەوە بۆ سەر سنور، لە ئێستاوە با ئاگادار بن.

بێستان: جا خۆ دوێنێ هاتینەوە.

کرمانج: ئیتر ئیشە بڵێین چی؟

بێستان: تۆش هەر لێرە چاوەڕوانمان ئەکەی؟

کرمانج: نا.. ئەمجارەیان منیش دێم.

بێستان: توخوا لەبری ئەو کوڕە خۆت لە سەیارەکەی من و تافانا بە.

کرمانج: هەوڵ ئەدەم ئەگەر ڕازی بێت (( خەندە )) بۆ لە بری ئەو؟ هەهە

تافان: ڕاستییەکەی ناوێری سەیریکەی، لێی ئەترسی.

(( پێکەنین ))

کرمانج: نا.. نا.. کوڕی چاکە.. ئەگەر ئەمرێکتان نییە بە یارمەتیتان.

(( خواحافیزی کردن لە کرمانج))

Cut

دیمەنی – ٣٠٢ – ڕ/ن – ماڵی حەمە خدر:

(( ژوورەکە کراوە بە ژووری میوان و تاقمی قەنەفەو تەپڵەک و گوڵدان و ڕاخەری جوانی تیایە، مەکتەبەیەکی بچووک و چەند کتێبێکی کەمی تیابێت جوانترە.. حەمە خدر وێنەی سەرەو ماڵە نیشانی نارەوەن ئەداتەوە))

خدر: تۆ دڵنیای ئەم دووانە بوون.

نارەوەن: بە خۆهەڵکێشانی مەزانە، یەکجار سەرنجی پیاوێک بدەم شێوەیم قەت بیر ناچێتەوە، بەڵێ هەر ئەو ڕۆژەی پێت نیشاندام و کە بینیمن یەکسەر ناسیمنەوە.

خدر: ئەی ئەگەر یەکجار سەرنجی ژنێک بدەی؟

نارەوەن: حەیفێ لە ژنا کۆڵەوارم هههههه

(( پێکەنین))

خدر: ئێستا هەموو شتێک ئاشکرابوو.

نارەوەن: چۆن؟

خدر: ڕێشار پارێزگاریتان ئەکا.

نارەوەن: کە دارەوان و ڕێشار حەز بە یەکتر نەکەن، بۆچی پارێزگاریمان ئەکا؟

خدر: تۆ پێم بڵێ کەسی نامۆ لە کۆڵانەکەتانا ئەبینی؟ چونکە پارێزگاری کچەکەت بکا، هی تۆش ئەکا.

نارەوەن: ماوەیەک بوو سەیارەیەک دووانی تیابوون، بە دوای خانوا ئەگەڕان بیکڕن، تا ئەوەی بەرامبەر (( ڕامانێک)) ... ئۆو ئەزانی خانوەکەیان چۆن کڕی؟

خدر: خانووی چی؟ کام خانووە؟

نارەوەن: خانووەکەی بەرامبەرمان، لە نرخی خۆی زۆر زیاتریان دانێ و بە یەک ڕۆژیش پێیان چۆڵ کردن و هاتنە ناوی، دوو کوڕی گەنج و ژنێکن.. ڕەنگە ئەوانیش هەر

لەوان بن، ئەگینا بۆ وا بە خێرایی و بە پارەی زیاتر؟ ئا ئا بیرم کەوتەوە، بە ئاڵوگۆڕ بوو و پارەیەکی زۆریش باقیان دانەوە، بە مەرجێ خانووەکەی خۆشیان نزیکە شارترو خۆشتریشە.

خدر: هیچ بەدوایا مەگەڕێ.. ئێستا تۆش چاودێریی ئەکرێیت و ئەشپارێزرێی.

نارەوەن: تۆ بڵێی تۆیان نەبینیبێ بە ڕیش و سمێڵەکەوە کە نیوەڕۆ هاتی؟

خدر: تیایا بوون؟

نارەوەن: نازانم سەرنجم نەدا، لە بەیانییەکەیەوە شتیان ئەهێنا، شتی هاکەزاییش بوون.

خدر: ئەبێ ئیتر وریابین، ئەوە من هەر ناااااایەم.

نارەوەن: ئاوا؟؟؟؟

خدر: ئیتر ماڵی ئێوە ئەمین نییە، بەکەڵک نایەت.. هەر لێرە یەکتر ببینین، لە هەموو شوێنێک باشترە.. ڕاستییەکەی تۆش ئەبێ کەمتر بێیتە دەرەوە.

نارەوەن (( هەڵئەسێ، وەک بچێ بۆ توالێت)): دارەوان ئاگادارە من زۆر دێمە دەرەوە، ئیتر قاچە بزنی وەک ڕێشار چییە حسابی بۆ بکەم؟ . تۆ مەمتۆقێنە!!!! یەک دەقە ئێستا دێمەوە.

(( نارەوەن ئەچێتە دەرەوە))

________ گەڕانەوەی هەیە ________ Cut ________

دیمەنی – ٣٠٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر – ژووری دارەوان:

(( دارەوان مۆبایلی بەدەستەوەیە))

دارەوان: نا نا.. زۆر خەمی پێوە هەڵمەگرە............ ئێ، ئەوەش ئەبێ، بابە خۆ کلیۆباترا نییە هههههە.......... نا نا هەر پێی بڵێن خۆی دێتە ژێر بار، ئەوە لەسەر من هههههە، حەزی لە ئیشە.......... ئیتر ڕەنگە پیرێژن نازونوز بکا هیچ نییە......... دەباشە دەی من کاتم زۆر نییە، لێرەش ئیشمان هەیە، ئەگەر بۆمکرا شەو سەرێکت ئەدەم کاکی خانەنشین هههههە............... بەخوا ئیتر ئاوایە، بۆ ناڵێی تەقاعود نیم؟............. ئەی چی؟ ................ باشە قوربان ئاگاتان لە خۆتان بێت..

(( مۆبایلەکە دائەنێتەوە.. زوبێر لە دەرگاوە سڵاوی لێ ئەکاو وەڵام، هەر لەناو دەرگاکەدا ئەوەستێ))

دارەوان: حەمەی فلتەران داوا ئەکا نارەوەن سەرپەرشتیی ئەو دایەنگایەی بۆ بکا کە دایئەنێ هههە.

زوبێر: جا نارەوەن کوا تاقەتی ئەو ئیشانەی هەیە؟

دارەوان: نا زۆر حەزی لە ئیشە، ممنونیش ئەبێ.

زوبێر: دەی کە حەزی لە ئیشە بیهێنە ئێرە، ڕاستت بوێ حەمەی فلتەرانم بەدڵ نییە.

دارەوان: بۆ ئێرە؟ ههە

زوبێر: ئەی چی، خێزانی خۆت نییە ههە؟

دارەوان: ئەگەر دێتە ئێرە !!!!! حای حاییی..

زوبێر: ئاخر ئەمەوێ بەزمت بۆ سازکەم، کە بینیم بە خۆیشی ئەڵێم هههههە

دارەوان: نا نا نەکەی کاکە، بەخوا یەک دەقە لێرە نامبینیتەوە هههە

(( پێکەنین و زوبێر ئەڕوا)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٣٠٤ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٠٢ - ڕ/ن – ماڵی حەمەخدر:

(( نارەوەن دەستی شتووە، ئەگەڕێتەوە))

خدر: کاک دارەوان و " تی" تەلەفونیان کرد.

نارەوەن: دارەوان کێشە نییە ڕاهاتووە وەڵامی نەدەمەوە، "تی" ش تیرۆژی کچمە، دوایی بۆی ئەکەمەوە کێشە نییە، تۆ ئێستا پێم بڵێ.. من سەرم لەوە سووڕ ماوە بۆچی ڕێشار ئەمانپارێزێ؟

خدر: لە دوای بەزمەکەی تریفەوە ئەمە ئەکا، ڕەنگە وا بزانێ ئێوە هەوڵەکە بە هەوڵی ئەو ئازانن، دیارە ئەڵێ نەک بەڵایەکی تریان بەسەرا بێت و بەسەر منیا بهێنن، ئەو ئەیەوێ پێشتر ڕێی لێ بگرێ.

نارەوەن: دەی ماڵی ئاوا نەبێ.. ئەی بەزمی ئاوەکە چی؟ دارەوان بۆ وایکردووە ڕێشار ئاویان بۆ بنێرێ.

خدر: یەک شتم بۆ ئەکەی؟

نارەوەن: سەرچاو، ئەی چۆن؟

خدر: هەرچۆنێکە قەناعەت بە تریفە بکە، ئەو دوو کرێکارە دەربکا، تا بزانین ئێستاش دارەوان ئاگادارە یان نا؟ ئەوکاتە گەر لەسەریان هەڵیدایە، دڵنیابە قسەوباسی خەڵک و ئەوەی خۆیان بەوجۆرە نیشان ئەدەن کە یەکتریان ناوێ، هیچ ڕاست نییەو هەر ئەوەش نا، بەڵکو گومانەکەمان لە جێی خۆیدایە لەسەر بارە ئاوەکان.. دڵنیابە شتێک هەیە.

نارەوەن: بەخوا زیرەکیی کەچەڵ هههههه

خدر: ئەوە بکەو دەعوەتی ماسییەکەش بیری خۆت مەبەرەوە.

نارەوەن: جا لە کوێ بیخۆین، تۆ دنیات کرد بە چەرمە چۆلەکە هههه.

خدر: نازانم، بۆ نایهێنی بۆ ئێرە؟

نارەوەن: نەوەڵا خۆت قۆزکەو بە جل و سەرو ڕیشەکەوە وەرەو ئەچینە شوێنێکی ڕاقیی.

خدر: نا، با بەو سەرو ڕیشەوە خەڵک نەمبینن، نەک کەسێکی ناحەز بمبینێتەوە.. قاتێکی تازەشم کڕیوە لەگەڵ کەلوپەلی مەتبەخ و کەوانتەرەکەیا.. هەر ئاوا ئەوە لەبەر ئەکەم و تەواو.

نارەوەن: چییە خاڵە دەستت لە خۆت بەرداوە، ئەڵێی پێشبڕکێم لەگەڵا ئەکەی، کەوانتەرو مەتبەخ و قات و فەرش و سەلاجەو جا ئیتر لە چیت کەمە؟

خدر: ئەزانم ئەڵێی چی. ئەوەیان نا، توخوا لێگەڕێ ئاوا زۆر باشین، ئەی نازانی کە ژنم هێنا ئیتر ناتوانین ئاوا بە ئیسراحەت یەک ببینین، خۆ سوێندی دنیای بۆ بخۆم بڵێم لە بری دایکمە، ئەو هەر بە ئەقڵی خۆی ئەجوڵێتەوە.

نارەوەن: کورە ئەبم بە خەسووی، ئیتر شەو و ڕۆژ لێرە ئەبم هههههه. سەعات چەندە؟

خدر: ئەک باوکی خۆم ڕۆ، ئێستا ناڵێن ئەمرۆ بۆ نەهاتووی بۆ ئیش؟ لە بەیانییەوە بازاڕو کەل و پەل و هێنانەوەی دیارییەکانت، ئا بە ڕاست، ژووری نوستنەکەش زۆر جوان بوو وا نا؟ دەستت خۆش بێ.

نارەوەن: شایانی زیاترینی پیرۆزت بێ.. یەکێکی وەک ئامۆ.. بۆ من چەند حمە خدرم هەیە؟

خدر: دووان.

نارەوەن: ئەی کوا ئەویتریان؟

خدر: ئەویتریان سەکسوکی هەیەو کەچەڵیش نییە هههههه.

نارەوەن: دەبا بڕۆم کات درەنگە، شتێ بۆ کچەکەش حازرکەم.

خدر: دەی منیش خۆم ئەگۆڕم و بمگەیەنە نارە خان.

(( چوونی خدر بە گورج و گۆڵیی بۆ خۆگۆڕین و نارەوانیش تێل ئەکا ))

نارەوەن: بەڵێ کاک ڕاهۆز تەلەفونت کردبوو......... لە دەرەوەم لە ماڵی حەماڵەکە............... چۆن؟؟؟؟ (( دەست ئەگرێ بەدەمییەوە)) ئەوە بەڕاستتە؟ ............. خۆمی لێ ئاشکراکەم؟ ......... یەعنی ئیتر بەیەکەوە ئیش بکەین؟ .............. نەوەڵا پێم ناخۆش نییە، بەڵام سوپرایز بوو بۆ من، توشی شۆک بووم .................. بۆ بینین خۆم ڕێگەیەک دائەنێم، جارێ مادام لێرەم با قسەی لەگەڵ بکەم، وا چووە خۆی بگۆڕێ......... باشە قوربان، بەسەرچاو، بێخەمبە .......... خواحافیز.

(( مۆبایلەکە دائەخاتەوەو بە خەندەو وەک چاوی گلەیی سەیری خدر ئەکا))

خدر: دیسان دارەوان بوو؟

نارەوەن: نەوەڵا کەتنەکانی تۆ بوو هەی کەتندەر!

خدر: من؟ من بۆ؟

نارەوەن: هەر یەکەمجار بینیتم، هەستم کرد شتێک بەرەو تۆ ڕامئەکێشێ، تا زیاتر ئەمبینیت خۆشەویستتر ئەبووی لەلام، هەر ئەمزانی تۆ کوڕی ئەو بارەو ئەو ئیشانە نیت.. لە خوا بەزیاد بێ، ئیتر لە ئێستاشەوە پێکەوە ئیش ئەکەین.

خدر: ئیشت بۆ دۆزیمەوە؟ ئاخر من جارێ ئیشیتر ناکەم.. ئیشەکەم باشە.

نارەوەن: هەی کەتندەر لە ئیشە نهێنییەکەتا ئیتر پێکەوە ئیش ئەکەین، ئیش دۆزینەوەی چیییی؟؟؟؟

خدر: ئادەی کام ئیشە؟ من هیچم نییە لەتۆم شاردبێتەوە.

نارەوەن (( پیا ئەکێشێ )): توخوا !!!!!!!!!!!؟ قسەش ناکەی.. دانیشەرەوە، با ڕێککەوین چۆن ئیش بکەین

(( پێکەنینی هەردووکیان و دڵخۆشیی و دیالۆگ))

ـــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٣٠٥ – ڕ- ئێوارە – ن – ماڵی دارەوان:

(( تیرۆژ هەر بە جلەکانی زانکۆوە دانیشتووە ))

تیرۆژ (( لەبەر خۆیەوە )): هیچ ڕۆژێک لەم کاتانەیا لە دەرەوە نەبووە، ئەبێ لە کوێ بێ؟ تۆ بڵێی ئەویشیان نەڕفاندبێ؟ جا خۆ کلیلم پێ نەبووایە، ئەبووایە هەر لەبەردەرگابم تا ئێستا... بەخوا ئەوە ئەزانێ کلیلی داومەتێ، ئیتر شەویش نایەتەوە.. ئای خوایە بەدەست دایکمەوە (( هەڵئەسێ )) با بچم شتێکی بۆ حازرکەم، کە گەڕایەوە بۆڵەبۆڵەکەشی لە هەمووی ناخۆشتر ئەگەر هیچ حازر نەبێ..

(( بەرەو مطبخ ئەچێ ))

Cut

دیمەنی – ٣٠٦ – ڕ – ئێوارەی درەنگ/ د – ناو سەیارەی نیزام:

(( هەڵشۆو نیزام سەیارەکە لێ ئەخوڕێ))

نیزام: چاک ناهێڵن سەیارەت پێ بێ؟ ئەک ئەو دەستەیان خۆش بێ، خۆ وا نەبێ لەگەڵ منا سەرناکەوی؟

هەڵشۆ: خێری زۆرم ئەدەنێ نیزام، زۆر عەنناببیە.

نیزام: ئاخر تۆش ئەزانی چی ئەکری! ئەی بۆ سەیارەیەکی شڕە ناکڕی پێی بێیت و بچی؟ هههە.

هەڵشۆ: دەی باوەڕکە، ئەوەش بکڕم ناهێڵن پێم بێ.

نیزام: کەواتە مەسەلەکە سەیارە نییە کاکە هەڵشۆ، مەسەلە ئەوەیە خۆت قۆزی و هەرچییەکت پێ بێ لێت دێت، ئیتر ئەوانیش وا ئەزانن بچنە ناویەوە لێیان دێت.

هەڵشۆ: ڕابوێرە !!!!!!

نیزام: نا بەخوا بەسەری تۆ بەڕاستمە کاکە هەڵشۆ.

هەڵشۆ: ئا لەو پێشەوە دامگری.. عەنناببیە

نیزام: ئەمشەو بۆ کوێ ئەچی؟

هەڵشۆ: هەر نادیە حەیاتەکە نییە؟

نیزام: دە شەوێکیش میوانی ئێمە بەو ئەچینەماڵەوەو.........

هەڵشۆ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): نا بەساقەوبم، ئێرە باشە.. من کەیفم بە جەوی ماڵان نایەت.

(( نیزام دایئەگرێت و هەڵشۆ بە لۆژەلۆژ ئەڕوات و نیزام ئەڕوات و دوور ئەکەوێتەوە.. هەڵشۆ دڵنیا ئەبێت کە نیزام لە چاو ون بووە، سەیارەیەکی بەرز وەستاوە، بە کۆنترۆڵ دەرگای ئەکاتەوەو سوار ئەبێت و دەرئەچێت))_________ Cut __________

دیمەنی – ٣٠٧ – ڕ – ئێوارەی درەنگ / د – دەشتاییەک:

(( تاهیرو سەرەو ماڵە ، تاهیر ماندووە زۆری لێدراوە.. سەرە سەیارە لێ ئەخوڕێت و ماڵەش لە پشتەوە لەگەڵ تایەردایە، سەیارە خاوی ئەکاتەوە تا بوەستێ))

ماڵە: لە بنی دنیاش بیت قوتارت نابێ با پێت بڵێم.. یەکجاریتر سۆراخی ئێمەو ئەو پیاوە بکەی کە بینیبووت، بە زیندوویی نامێنیت، چۆن کەوتیە بەردەستمان، ئاوا ئەکەویتەوە بەردەست، با پێت بڵێم.

سەرە: لە هەر شوێنێکیش هەر یەکێکمانت بینی، خۆت وەک نەناس نیشان ئەدەی خوێڕی، نەخڵەتابی هەر سەیری پێلاوەکانیشمان بکەی.. بەسەری ئاژدادت ئەتکوژین.

تایەر: زۆر مەمنونتانم نەمزانی وایە، بەڵێن بێ لێتان نزیک نەکەومەوە هەتا ماوم.

ماڵە: جا گەر خواش ئەوەی پێکردی کە گەڕایتەوە شکاتت لێ کردین لە پۆلیس، ئەوەش باشتر.. با پێت بڵێم کەس ئێمەی بۆ نادۆزرێتەوە، تەنها تۆ نەبی، ئەویش ئەوکاتەی بە گوللەیەک ساردت ئەکەمەوە، تێگەیشتی؟

تایەر: باوکم بەس ئەمجارە مەمکوژن، ئیتر بە ژیانتان من نابیننەوە، خوا ئەکا نامکوژن !!!!!

(( سەیارەکە تەواو خاوی ئەکاتەوەو ماڵە فڕێی ئەداتە خوارەوەو بە خێرایی دەرئەچێ))

Cut

دیمەنی – ٣٠٨ - ش/ن –ماڵی هەندرێن:

Mute

(( هەندرێن و تافان و باڵاو کلّپە.. زوبێرو دارەوان و چیمەن و بروسک و سەلوا.. لە دیمەنەکەدان.. شیرینییان لە بەردەمدایە .. دایالۆگ و پێکەنین و هەستان و دانیشتن و چپەی چیمەن و سەلوا.. سەلوا مکیاژی تەواوی کردووەو جلوبەرگی تازە))

Cut

دیمەنی – ٣٠٩ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٠٥ - ش/ن –ماڵی حەمەخدر:

(( حەمەخدر و نارەوەن تەنها شوێنی دانیشتنیان گۆڕاوە))

نارەوەن: وای لێ ئەکەم، بەوجۆرە ئەویش ئەبینم و خۆشمان لەمەودوا سێ ڕۆژ جارێک یەکتر ئەبینین.

خدر: ئەی ئەگەر ئیشی زەرور هەبوو؟

نارەوەن: ئەو کاتە جیاوازە.. ئا (( پێ ئەکەنێ)) کابراش وتی لە کوێی؟ وتم ماڵی حەماڵەکە.. بەلایەوە ئاسایی بوو هههە.

خدر: کچێ ئەوان لەوسەری ئێمەشەوە هاتوونەتەوە، ئەوەندە فەقیر نیین، سوور زانیویانە لێرەی بۆیە پرسیاری لێکردووی، تا ڕاستگۆییتی بۆ دەرکەوێ.

نارەوەن: جا ئەوە کێشەی ئەوانە چۆن بیر ئەکەنەوەو ئێمەش بیر لە چی ئەکەینەوە، کەواتە هەروا باشترە کەمتر یەک ببینین.. ئیتر بڕۆم باشترەو تۆش ئەو جلانە داکەنە، بەمشەوە بۆ کوێ ئەچی؟ هههە ئای ئەمڕۆ چیمان کرد چیمانکرد بە قسە هههە

خدر: من زۆر دڵخۆش بووم، کە هەموو ئەمڕۆم هەر تۆ بوویت، ئیتر وا کار بەخێر گەڕاو ئەم شەراکەتیشی تێکەوت، بەڕاستی زۆرتر دڵخۆش بووم.

نارەوەن (( هەڵئەسێ)): یاخوا هەر دڵخۆش بیت منیش هەر ئەوەم ئەوێ.

خدر: ئەی تۆ؟

نارەوەن: ئۆو هەر زۆر زیاتر.. بەشی ساڵێ قسەمکرد هههە.

خدر: ناکرێ تۆزێکیتریش دانیشی؟

نارەوەن: هێشتا پێی کەمە کاکم؟!.. هەر نازانم چی بەو کچە بڵێم کە ئەڕۆمەوە، ئەوە ئەزانم ئێستا ئەوەندە تورەیە ، ئەوەتا تەلەفونێکیشم بۆ ناکا لە ڕقا.

خدر: سوپاس بۆ هەموو شتێک نارەخان گیان، بەڕاستی نمونەی ئینسانی گەورەیت.

نارەوەن: خۆت گەورەیت حمەخدر گیان، منیش سوپاست ئەکەم بۆ هەبوونت، وەک وتم ژیانت جوان کردم، بە تۆوە ژیان جۆرێکیترە، سوپاس بۆ گرنگیی پێدانت کوڕە شیرینەکەم. دەی ئیتر بە ئیزنی تۆ باوانم.

(( تەوقەو خواحافیزیی ئاسایی و بەڕێکردنی نارەوەن))

——— تابع ——————— Cut ———————

دیمەنی – ٣١٠ – متبوع – ش/د – بەردەمی ماڵی خدر:

((کە نارەوەن دێتە دەرەوەو ئەڕوات بۆ سەیارەکەی.. پیاوێکی بە تەمەنی ڕیش سپیی ئیسلامیی دراوسێی خدر تەماشای ئەکات، و استغفراللە ئەکات))

نارەوەن: ئەوە ئەستەغفیرەڵڵا لە چی ئەکەی برا؟

پیاوەکە: ئەی چوزانم، ئەو کوڕە کەسی نییە، تۆ بەم شەوە چی ئەکەی لە ماڵی ئەوا؟

نارەوەن: ئەوە کوڕمە بەدگومانی دڵپیس ((ئەگەڕێتەوەو لە دەرگای حەمە خدر ئەدا))

پیاوەکە: دەی باشە بۆ ئاگاداری ئەکەیتەوە؟ بڕوامکرد.

نارەوەن: وەک قسە ئەکەی یەک دەقەش بوەستە با ڕووبەڕووی ئەوت بکەمەوەو من بڕۆم.

خدر(( دێتە دەرەوە)): ئەوەچییە دایکە؟

نارەوەن: بزانە ئەم دراوسێیەت ئەڵێ چی؟

پیاوەکە: من ظنێکی خراپم کرد، نەمزانی دایکتە، گەردنم ئازاکەن.

نارەوەن: ئەک گەردنت ماری حەوتسەر پێیەوە با.. ((ئەڕوات بەرەو سەیارەکەی))

خدر: ئەوە تۆ عەیب ناکەی کاکە؟ تاکەی چاودێریی کردنی خەڵک دڵخۆشتان ئەکا؟ ئینجا شتێکیش دروست ئەکەن کە هیچ بنەمای نەبێ.

پیاوەکە: بەخوا ببورە بە صدفة دەرگام کردەوە.

خدر: نا درۆ ئەکەیت، چەند جارێکیترم بینیوی سەیری ئەم دەرگاو ئەو دەرگا ئەکەی.. شەرمێ لەو ڕیشە سپییەت بکە.

پیاوەکە: باشە برا عەفومکە.

Cut

دیمەنی – ٣١١ – ش/ د – دەشتاییەک:

(( بەدەم ئاخ و ئۆفەوە تایەر هەر دوو هەنگاو ئەڕوات و ئەکەوێ، تین ئەداتە بەرخۆی و کەمێکیتر ئەڕوات، تا ئەگاتە قەراغی جادەیەک، بە پێوە دەست لە سەیارە ڕائەگرێت و جاروبار ئەکەوێ، تا سەیارەیەک بۆی ئەوەستێت و سڵاوێک و پێی ئەڵێ بتبەم بۆ کوێ؟))

Cut

دیمەنی – ٣١٢ – ش/ن – ماڵی ڕێشار:

(( ڕێشار دانیشتووە.. پاش تاوێک کرمانج دێتە ژوورەوە))

کرمانج: گەورەم ئەنجامی بەڵگەی تاوان و چۆنێتی کوشتنەکە دەرکەوت.

ڕێشار: باوەڕ ناکەم کەس بزانێ کێ کوشتوویەتی؟ چونکە کەسێکی ئەوەندە زیرەک کوشتوویەتی، هیچ ئەسەرێک جێ نەهێڵێ.

کرمانج: بەڵێ ڕێک وایە، نەک جێگە پەنجە تەنانەت جێ پێشی دیار نییە.. پاشا بوو گەورەم؟ دیارە زۆر بەهێزو بە خۆوەیە. خۆزگە بە خزمەتی بگەیشتمایە.

ڕێشار: کەس بە خزمەتی ناگا بە منیشەوە، لە شوێنێک نییە من و تۆ بیگەینێ.

کرمانج: بە هەرحاڵ، گرنگیدانی ئەو بە دەوڵەمەند بوونم هەموو شتێکە.. زانی ئەمجارە خێرێک لە سەفەرەکەدا نییە، منی نەنارد.. کەچی ئەوەتا بە خێرایی سەفەرێکیتری دروست کردو منیشی تێخست، ماڵی ئاوا بێ.

ڕێشار: کرمانج بەدنمەک مەبە.. پاشا لەسەر قسەی من متمانەت پێ ئەکاو تۆی هێناوەتە ڕیزەوە، ئەوە منم شتت بۆ ئەکەم نەک پاشا.. بە هەموو ژیانت تۆ گوێت لە دەنگی پاشا نابێ با بزانی، ئیتر کەمێک وەفاش باشە.

کرمانج: گەورەم تکایە.... من سوپاسگوزاری خوام کە ناسینی جەنابتی پێ ڕەوا بینیوم، من دڵنیام سەرچاوەی ژیانیشم جەنابتی و لەدەست خۆشتدایە.. هەرکاتێ ویستت لێم بسێنیتەوە، ژیانم فیداتە گەورەم.. داوای لێبوردن ئەکەم، ئەگەر بە بێ مەبەست هەڵەم کردبێ.

ڕێشار: دەی باشە زۆر چەنە مەیە، ئەو بوتڵە تازەکەم بۆ بێنە کە لە ئیسپانیاوە بۆم هاتووە، .. ئیتر تۆ بڕۆوە.. تا سبەی خزمەتکارەکەش دێت، وا پاشا بۆی دابینکردووم.

کرمانج: ئەی مەزەت بۆ دروست نەکەم؟

ڕێشار: نا خۆم حەز ئەکەم جاروبار بجوڵێم، دووایی شتێک دروست ئەکەم، عەزێت مەکێشە، تۆ بڕۆوە ماڵی خۆت.

کرمانج: باشە بەسەرچاو..... (( کرمانج بوتڵێک ویسکی ئەهێنێ لەگەڵ پەرداخێکی ویسکیداو ئەگەڕێتەوە بۆی دائەنێت)) گەورەم دڵنیابم جێت ئەهێڵم.

ڕێشار: ئەها مەبەستت کابرایە کە دێت؟

کرمانج: بەڵێ، باشی ئەیناسیت؟

ڕێشار: خەمت نەبێ کرمانج، یەکەم قەت ئەوەندە سەرخۆش نابم خەڵک زەفەرم پێ ببات.. دووەمیش کەس نەیتوانیوە شەوێک لەم ماڵەدا بمێنێتەوە، لە خزمەتکار زیاتر.. دوای ئەوەی ئیشی خۆم تەواو ئەکەم، ڕەوانەی ئەکەمەوە.

کرمانج: دەباشە گەورەم ئەگەر ئەمرێکت نییە.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی کرمانج و دەرکەوتنی مالە دێتە لای ڕێشار))

مالە: ئای خوایە ئەم کرمانجەش گێلە، وائەزانێ ئێمە جێت ئەهێڵین.

ڕێشار: با وابزانێ هەر خۆم بە تەنهام.. جارێ ئیشم بەوە هەیە، لێیگەڕێ.

(( حواری مالەو ڕێشارو دواتریش لە دەرگا ئەدرێ و سەرە دێت))

Cut

دیمەنی – ٣١٣ – ش/ د – بەرماڵی تایەر:

(( کابرای شوفێر دائەبەزێت و دەست ئەخاتە بنباڵی تایەرو لە دەرگا ئەدا.. باوکی تایەر پیاوێکی پیری بەساڵاچوو و زایەری برای گەنجێکی تەمەن نزیکەی ٣٤ ساڵ دێن و پرسیار ئەکەن چی ڕوویداوەو تایەر سوپاسی سایەقەکە ئەکات و با باوک و براشی ئەڵێ دوایی پێتان ئەڵێم ئەم کابرایە فریام کەوتووە، ئەوانیش سوپاسی ئەکەن و فەرمووی ژوورەوەی لێ ئەکەن))

سایەق: بیگەیەننە خەستەخانەیەک، وەزعی زۆر خراپە.

باوک: بەس بزانم بەچی وای لێهاتووە؟ ڕۆڵە شۆقڵ لێیداوی؟

زایەر: ئەی سەیارەکەی کوا؟ بەخوا دیارە وەرگەڕاوە.

سایەق: بابە سەیرێکی بکەن ئەزانن لێیدراوە.. دەی من بە یارمەتیی ئێوە.

(( سایەق ئەڕواو ئەوان ئەیبەنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٣١٤ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( هاوڕێی لێیەو خدر دێتە ژوورەوە، ئەگەر خەڵکیتریش هەبێ))

هاوڕێ: ئەوە دوێنێ لەکوێ بووی کەچەڵ؟ هەمووی هەواڵی ئەپرسیت.. بینیویانی سەوای تەباخ و مورەشەح و ئەو شتانەت کردبوو.

خدر: ئەها ئەوە زاواکەی کاک زوبێر بۆی گێڕاویتەوە، وا بوو هات و بینیم.. وەڵا دوێنێم تەرخان کرد بۆ خۆم هاوڕێ گیان.. ناومالّم کڕێ و ڕێکمخست و کورە هەر کردم بە مالّێکیتر.

هاوڕێ: ئەک بەخۆشیی بێ یاخوا.. ڕەنگ و ڕووەکەشت جوانتر بووە حەمەخدر، بەخوا دیارە بە نیازی کاری خێری؟!

خدر: نەء....... نەء هەرچی بڵێی ئەوەیان نا... من و ژن کوجا مەرحەبا.

هاوڕێ: ئەی ماڵ بۆ کێ؟

خدر: هەر بۆ خۆم، ئەی پیاو پارە لە خۆیا خەرج نەکات بۆچییەتی؟ وەڵا بێ دڵیی خۆم ناکەم.

هاوڕێ: دەی وەڵا هەزارجار دەستت خۆش بێ، هەر ئەوە باش ئەکەی.. بەس توخوا سەر نەکەیتە سەر شتی خراپ خدر گیان.

خدر: حەیفت نەکرد هاوڕێ گیان؟ جا من کاری خراپم لێ ئەوەشێتەوە؟

هاوڕێ: ئاخر چوزانم هەموو کەسێک کە پارەی زۆری بینی قابیلی گۆڕانە.. تۆش ماشەڵڵا دوور بی لە چاوی پیس، زۆر ئەجوولّێی.

خدر: ئەوەیان من ناگرێتەوە، بێ دڵیی مەبەستم خواردن و جلوبەرگ و ناوماڵ و ئەو شتانەیە.. پارەش بۆ ئەوە باشە، بەخوا لە قۆزیی کەمترم داوا نەکردووە، مەگەر پێڕانەگەیشتبم لای تۆ لەفەیەکم خواردبێ.

(( چاخواردنەوەو حوار)) ________________ Cut ____________

دیمەنی – ٣١٥ – ڕ/ن – ماڵی دارەوان:
(( نارەوەن بە مۆبایل))
١-بەڵێ ڕێک خانووی سەرسووچەکە........ ٢- من سەعات دوو و نیوی ڕێک لەوێ ئەبم، جەنابت پێنج دەقە دوای ئەوە بێیت زۆر باشە، تا لەگەڵ کیژانی ئامۆزام، بە خێرایی تێی بگەیەنم کێشەت هەیەو من ئەتوانم هاوکاریت بکەم ........ ٣- زۆر ڕاستە منیش ناتوانم بتبینمەوە، خەڵک چووزانێ بۆ یەکتر ئەبینین؟ شتیکیترم لە خەیاڵە لەوێ پێت ئەڵێم، با تەواو گەلاڵە بێ لە مێشکما ........ ٤- کاتی خۆش بۆ ئێوە.
(( نارەوەن ئەو تەلەفونە دائەخات و تێل ئەکاتەوە))
١-تبیری دایکی خۆتت نەکرد؟ ههە......... ٢- سوپاس.. گوێبگرە ...... ٣- قسەم لەگەڵا کردو پێموت بێتە ئەوێ، هەر زوو بە کیژانیشم وت عەسر بۆ ئیشێک دێم بۆ ماڵتان بەهرۆزی مێردت لەوێ نییە؟ وتی نا ئەو شەو سەعات ١٢ دێتەوە، وتم با بزانی سەعات دوو و نیو ئەچم بۆ ئەوێ.......... ٤- بە دڵنیایی نامەکەی تۆی ئەدەمێ، خەمت نەبێ، بڕیارمان وایە ئیتر قەت یەکتر نەبینین، شتێکی وا ئەکەم کارەکە ئاسانتر بێ لە بینین، بە نامە یان لە واتساپەوە، یان لە ئیمۆوە بۆی ئەنێرم، بەڵام ئەمڕۆ مەبەستم بوو ببینم و هەندێ شت هەیە بۆم ڕوون بکاتەوە ........... ٥- زۆر سوپاس، ئەوەم پێ باشتر بوو ........ ٦- دوو بەیانی .............. ٧- (( پێکەنین)) ........ ٨- یەعنی وەک تۆ بەختەبارانی منیت، منیش بەختەبارانتم؟ ............... ٩- بەساقەوبم تاقانەکەی برام، قوربانت، قسەت چەند شیرینە، بەینی خۆشمان بێ خراپ خووت شەڕ کردووم.. کە ئەزانم کەس وەک تۆ قسەم لەگەڵ ناکا، منیش بەقەدەر خۆیان وەڵامیان ئەدەمەوە........ (( مۆبایل دائەخاتەوە و خەندەیەک)).

Cut

دیمەنی – ٣١٦ – ڕ/ن – ژووری نەقیب ڕاهۆز:
(( ڕاهۆز بە مۆبایل))
١-ئێ زۆر باشە، عەسر سەعات چەند؟ ........ ٢- ئەوە زۆر باشە، خۆت ئەزانی خەڵک بەهۆی وەزیفەکەوە زۆر ئەمناسن، با سەرنجێکم لەسەر دروست نەبێ.. بەڵام ببورە هەر ئەمجارە دائەنیشین و ئەبێ میکانیزمێکیتر بدۆزینەوە .......... ٣- زۆرباشە نارەوەن خان.. تا ئێوارە، بە هیوای دیدار.... ٤- بۆ ئێوەش.

Cut

دیمەنی – ٣١٧ – ڕ/د – شوێنێک:
(( خدر بە مۆبایل))
١-با.. زۆریش.. دوێنێ ئەوەندە زۆر پێکەوە بووین، ئەمڕۆش بە بەرچاوما هەر دێیت و ئەچی ...... ٢- فەرموو قوربان! ......... ٣- زۆرباشە گەورەم، دەستت خۆش بێ، ئەو نامەکەی منی بدەرێ. ئەی جاریتر چۆن ئەیبینی؟ باش نییە زۆر یەک ببینن........ ٤-ئۆۆ ئافەرین، تۆ بەردەوام نێتت لایە، ئەتوانی ئەوە بکەی، جوانترین و باشترین بیرۆکەیە. دەستخۆش.......... ٥- زۆر ڕاستە، ئەی کەی ئەتبینم؟ ............ ٦- کە دوورە دوو بەیانی ............ ٧- بەچی پێ ئەکەنی بەخوا بەڕاستمە، ئیتر خۆ من لە ئێستاوە لە بەردەستی تۆیا ئیش ئەکەم............ ٨- کچێ بەختەبارانی چی؟ ئۆووو ........ ٩- ئەگەر ئەوە خوو شەڕ کردن بێ، خراپ نییە، ئیتر حکوملەگەڵ کەسیترا زۆر قسە بکەیەتێک پشت بە تۆ ئەبەستێ، نابێ هههههە.(( ئەردەلان نزیکی ئەبێتەوە)) خەڵک هات جارێ خواحافیز. (( مۆبایلەکە دائەخاتەوەو هەڵی ئەگرێتەوە)) ها ئەردەلان، خێر؟
ئەردەلان: برۆ کاک کرمانج بانگت ئەکا، هەر خەریکی تەلەفونی
خدر: باشە سوپاس (( ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٣١٨ – ڕ/ن – نەخۆشخانە:

(( تایەر لە نەخۆشخانە کەوتووە، ئەفسەر پرسیاری لێ ئەکاو کاتبێک مەحزەرەکە ئەنوسێتەوە ))

تایەر (( بەگریان و زەلیلیی )): زۆریان لێدام.. بەخوا زۆر.. هەر زۆر زۆر!

ئەفسەر: تۆ بە بووراوەیی دۆزراویتەوە، ئەوانەی لەو شوێنە فڕێیانداى، خۆیان پێ نیشاندایت؟

# (( ئەڵقەی شانزە ))

تایەر: نەمبینین، لەو کاتەوەی بەردەستیان کەوتم لێیاندام، تا لە هۆش خۆم چووم.

ئەفسەر: چەند کەس بوون؟

تایەر: نازانم، وا بزانم دووان بوون.

ئەفسەر: نایانناسیتەوە؟

تایەر: هەر نەمبینین.

ئەفسەر: نازانی بردیانیت بۆ کوێ؟

تایەر: هیچ شتێک نازانم، هیچ هیچ.

ئەفسەر: گومانت لە کەسێکی دیاریکراو نییە؟ شتێک پێشتر ڕوویدابێت؟

تایەر: بە هیچ جۆرێک.

ئەفسەر: ناکرێ دوو کەس یان زیاتر، لە ختوخۆڕایی بتبەن و بەو دەردەت بەرن، هەر ئەبێ لەسەر شتێک بێ، گەر تۆش لەسەر هەق بیت.

تایەر: من هیچ شتێک شک نابەم، بەڵێ لەسەر هیچ ئاوام لێکراوە.

Cut

دیمەنی – ٣١٩ – ڕ - عەسر/ د – کۆمپانیای ڕێشار- ژووری کرمانج:

(( کرمانج و ڕێشار بە پێوەن و خدر دواتر دێتە ژوورەوە ))

خدر (( بە شەرمەزارییەوە )): ئەمرکەن گەورەم.

کرمانج: سبەی خۆت ئامادەکە ئەچین بۆ سەر مەرز، وەک دوێنێ خۆت بزر نەکەی.

خدر: بەسەرچاو گەورەم.. ببوورە دوێنێ خەریکی ناوماڵ ڕێکخستن بووم.

کرمانج: سەعات حەوت لە بەردەمی کۆمپانیا ئەبیت.

خدر: بەسەرچاو گەورەم. (( هەر وەستاوە ))

ڕێشار (( تورە )): ئەی چاوەڕوانی چیت بۆ ناڕۆیت؟

خدر (( شڵەژاو )): وەڵا هیچ قوربان وتم بزانم ئەمرێکیترتان نییە.

ڕێشار: گوێبگرە هەتیو!.. لەمەودوا لە هیچ ژوورێک نامێنیتەوەو دایکوتی، هەرکەس ئیشێکی پێت بوو، قسەکەی وەرئەگریت و مل ئەشکێنێ، لە هەر ژوورێک ببینم یان ببیستم دانیشتبی، هەر بەشەق تا سەرجادەکەت ئەبەم، خۆت ئەزانی ئێمە یەکجار خەڵک ئاگادار ئەکەینەوە، دووەمجار سزاکەی ئەدەین.

خدر: بەڵێ فەرمانتە گەورەم، جارێکیتر دووبارە نابێتەوەو تێگەیشتم.

ڕێشار: دەی بڕۆ ملت بشکێنەو ونبە لەبەرچاوم.

(( خدر زۆر بەخێرایی ئەڕوا، بەجۆرێک لە دەرەوەی ژوورەکە ئەکەوێت.. پێکەنینی ڕێشارو کرمانج ))

ڕێشار: بەدڵت بوو؟

کرمانج: دەمخۆش گەورەم، هەر زۆر زۆریش. (( ڕێشار ئەچێتە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ٣٢٠ – ڕ/ د – بەردەمی ماڵێکی ئاسایی:

(( لە دەرەوە دەرگاکە نیشان ئەدرێت.. دەرگا ئەکرێتەوەو نەقیب ڕاهۆز دێتە دەرەوە، دوای ئەویش نارەوەن بە جلی دەرەوە))

نارەوەن: تەنها کێشەم نوسینەوەی ئەوانەی ئەو ئەبێت، کاتێکی زیاتری ئەوێت.

ڕاهۆز: هەوڵبدە کورتی بکەیتەوە ئەگەر توانیت.

نارەوەن: نا نا ئەوەیان ئیشە کەمتەرخەمیی تیا ناکەم، هەمووی ئەنوسمەوە.

ڕاهۆز: بە دڵی خۆت.. با من زیاتر نەوەستم، ئەگەر ئیشێ کارێکت نییە بڕۆم.

نارەوەن: هەر خۆشیت.

ڕاهۆز: بە هیوای سەرکەوتن و چاوەڕوانی چالاکی وردو کاریگەرتانم.. دەستتان خۆش.

نارەوەن: بەو هیوایە.. خوات لەگەڵ کاک ڕاهۆز.

ڕاهۆز: خوا ئاگادارتان بێت. (( سەیارەکەی ئەو و نارەوەن بەرودوا وەستاون.. ڕاهۆز ئەچێتە سەیارەی خۆیەوەو ئەڕوا.. نارەوەنیش تا ئەو ئەڕوا ئەوەستێ و دواتر ئەچێتە ژوورەوەو دەرگا دائەخاتەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٢١ – ڕ- عەسر/ن – دوکانی ئاواو ئامۆ:

(( ئاوا تێل ئەکا، ئامۆ لەگەڵ مشتەریی سەرقاڵە))

ئاوا: باشە تیرۆژ گیان، ئێستا دەرئەچم.. دەستخۆش ....... دەی بای. (( تەلەفونەکە هەڵئەگرێتەوە)) باش بوو ئەم وەزعە دروست بوو.

ئامۆ: باشی چی بوو، ئەزانی تا دێیتەوە چۆن ئەبم بە فرفرۆکە؟

ئاوا: بەخوا تیرۆژیش زۆر گوناحە ئامۆ، شوێنەکەی زۆر دوورە، ئەم چەند ساڵە مەگەر هەر خوا بزانێ چەند ناڕەحەت بووە، خۆی ئەو هاتوچوونەی منیش خۆش نییە، بەس ئەویش زۆر گوناحە.

ئامۆ: دەباشە کاکە بڕۆ، هەوڵبدە زوو بێیتەوەو ئاگاشت لە خۆت بێت.

ئاوا: دەی باشە، جارێ بای.

(( ئاوا ئەڕوات و یەک دوو مشتەری تر دێن و پرسیار ئەکەن یان چاو ئەگێڕن))

Cut

دیمەنی – ٣٢٢ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان و سەلواو ڕێژوان.. کلێپەو باڵا ئەمدیوەو دیوی ڕێژوان دانیشتوون))

هەندرێن: زۆر باشە، لەگەڵ دایکتا بژین هیچ عەیبی نییە.

سەلوا: بەیانیی دوو بەیانیی خانوەکە ئەکرێت و ئیتر بە پەلە تەدارەکەکەی ڕێک ئەخەین.

تافان: زۆر باشە، بەیانیش ئەتوانی ئاگات لە منداڵەکان بێت؟

سەلوا: ئەی چۆن؟

باڵا: ئەی ڕۆژێکیتر؟

سەلوا: بەردەوام ئاگام لێت ئەبێ باڵا گیان، هیچ خەمت نەبێ.

هەندرێن: بەخوا ئەم ئیشە زۆر لە گیانم قورسە.. ئەوەش نەبێ ناژین چی بکەین؟

ڕێژوان: خەمی هیچت نەبێ کاکە هەندرێن، هەمووی چارەسەر ئەکەین.

(( دایالۆگی زیاترو سوعبەت کردنی کلێپەو باڵا لەگەڵ ڕێژوان))

Cut

دیمەنی – ٣٢٣ – ڕ/ د – قەزا:

(( خدر دوو کارتۆن لە سەیارەکەی ڕێشارەوە دەرئەکات و ئەیهێنێتە سەیارەی کچەکانەوە، کارتۆنەکان بە نایلۆن تغلیف کراون.. ڕێشار دێتەوە نزیکی سەیارەی کچەکان.))

ڕێشار: با بزانین ئەمجارەیان چی دەرئەچێ؟!

بێستان: ئەی بۆ لێرە نایکەیتەوە بزانی چۆنە؟

ڕێشار: تۆ ڕێگە بۆ من دامەنێ بێستان خان، ئەوە گەر هەڵیپچڕین، یەکەم سەیتەرە هەزار گومانی لا دروست ئەبێ.

بێستان: حەددی ئەوەم نییە کاک ڕێشار گیان، ڕاست ئەفەرمووی قسەی جەنابتە، ئەبێ خۆی هەڵیپچڕێ تا دڵنیا بێ.

کرمانج: قسە لە قسەی گەورەما مەکە، خۆی ئەزانێ چی ئەکاو چی ناکا، شارەزاترینمانە.

تافان: دەستت خۆش بێ گرنگ دیارییەکەیە وەرمانگرت، زۆر سوپاس.

بێستان (( کەمێک لالوت)) زۆر سوپاس دەستخۆش.

ڕێسار: دەی بکەونەوە ڕێ دەستوبردکەن.

(( کرمانج لە سەیارەی کچەکاندایەو خدرو هەندرێن پێکەوە، سەرەو مالەش لەگەڵ ڕێشار.. سەیارەکان ئەکەونە ڕێ))

Cut

دیمەنی – ٣٢٤ – ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( تریفە بە مۆبایل، یەکێک لە کرێکارەکان لەسەر مێزەکەی تەنیشتی دانیشتووە ))

نارەوەن (( دەنگ )): مانای چی باوکت قبووڵی نییە؟!

تریفە: بڵێم چی دایکە؟ وتی بۆ پاراستنی تۆ کرێیان ئەدەمێ نەک ئیش و کار.

نارەوەن: خەریکە شتێک تێ ئەگەم، خۆ نەتوت دایکم پێی وتووم؟

تریفە: چک، تۆ وتت پێی نەڵێی.. بۆ ئەوە هیچی تیایە دایکە؟

نارەوەن: نا دایە گیان، بەڵام با نەزانێ هەندێ شت ئەزانم..

تریفە: شتی وەک چی؟

نارەوەن: ئەوەت پێ ئەڵێم با کاتی خۆی بێت.. خەمت نەبێ، مادام ئەو دووە ئەتپارێزن، با هەر لەوێ بن، باوکت باشتر ئەزانێ.

تریفە: دایکە وەک بزانی خۆ ژیانم لە مەترسیا نەماوە؟!

نارەوەن: دایە بە قوربانت بێ چۆن ئەهێڵم؟ چرکە بەچرکە ئاگادارتم بە قوربانت بم، خەمی هیچت نەبێ.

تریفە: ئای لە نارەوەن! هههە بە چی چرکە بەچرکە ئاگادارمی هههەه؟

نارەوەن: بە مۆبایل ههههەه

تریفە: وەڵا ڕاست.

نارەوەن: باشە گوڵەکەی دایە، تۆش ئاگات لە خۆت بێ بەساقەوبم.

(( خواحافیزیی و لە میانەی قسەکاندا ڕۆشتن و هاتنی مشتەریی، کرێکارەکەش هەر دیقەتی تریێ ئەدا لە تەلەفونەکەیدا ))

Cut

دیمەنی – ٣٢٥ – ڕ – عەسر/ د – سەرجادەی گشتی:

(( ڕێشار بە تورەیی هەردوو کارتۆنەکەی بۆ کچەکانی کڕیوە، فڕێی ئەداتە سەر قەراغی جادەکەو سەرەو مالە کۆی ئەکەنەوەو ئەیخەنە سەیارەکەی ڕێشارەوە))

ڕێشار(( گرژ)): باوکم بیللاهی ئەو شوێنە هی شت کڕین نییە، ئاخر ڕێی تێ ئەچێ لە سێ جارا دووجار فێڵت لێ بکرێ؟ ئەوە ئەویتریان خواردی بەدەستم، شەرتبێ ئەمیش بیخوا.

بێستان: شتەکان باش بوون کاکە ڕێشار.

تافان: هەر زۆر جوانیش بوون.

ڕێشار: دایکەکەم بۆ من جوان نییە بچنەوە ماڵەکانتان و بڵێن فلانەکەس جلی ژێرەوەی بۆ کڕیوین، جا بۆ حەیاشم نابەن؟ (( دەست ئەکا بە گیرفانیا))

بێستان: دەست مەکە بە باخەڵتا کاکە ڕێشار، پارەت لێوەرناگرین.

تافان: بەهیچ جۆرێک.

ڕێشار(( دەست ئەگێڕێتەوە)): مادام قسەتان شکاندم، ئێوە جێتان لای من نەماوە.. سبەی کە هاتنەوە بڕیارێکی لێ ئەدەین.

کرمانج: حەقی خۆیەتی.

بێستان: ئێمەش سوپاستان ئەکەین.

ڕێشار: دە کەوابێ بەیانی سەرێکی کۆمپانیا بدەن، دوو قسەی لێ ئەکەین.

(( ڕێشار ئەگەڕێتەوە بۆ سەیارەکەی خۆی))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٣٢٦ – ڕ/ د – گوند:

Mute

(( دیدەوان جلوبەرگی کۆنتر بووە، سەرو ڕیشی هاتووە، گۆچانێکی بە سروشتی لادێ بە دەستەوەیەو بە یاڵێکدا سەر ئەکەوێ کە شوانێک و هەندێ مەڕوماڵاتی لێیە، ئەچێتە لای شوانەکەوەو دیالۆگ هەیە))

Cut

دیمەنی – ٣٢٧ – ش/د– بەردەمی کۆمپانیای ڕێشار:

(( سەرەو ماڵە لە لایەکەوە پێکەوە وەستاون و لە میوتیدا قسە ئەکەن، خدریش لە شوێنێکیترەوە بە چیچکانەوە دانیشتووە))

سەرە: وریابە نەک بانگتکەن.

خدر: گوێم سووکە قوربان خەمت نەبێ.

Cut

دیمەنی – ٣٢٨ – ش/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج، کیسە تلیاکەکان لە کارتۆنی کچەکان دەرئەکەن، کە جلوبەرگی ژێرەوەی ژنانەیە، لە کارتۆنێکی ئاوادا لە ژێرەوە دایئەنێن و جامە ئاوە بچووکەکان لە سەریەوە دائەنێن و کارتۆنەکە دائەخەنەوە.. دوو کارتۆن بەوجۆرە ئیشی تیا ئەکەن و بەدەم دایالۆگەوە ))

ڕێشار: تەنها بەو دەسکەوتەی لەمەدا پێت ئەبڕێ، تۆ ئەگەیەنێتە مەرامی خۆت.

کرمانج: گەورەم بەڕاستی شتێکت کرد نەکراوەبێ، چاکەیەکە بۆ هەتا هەتایە بیرم نەچێتەوە.

ڕێشار: ئەگەر یەک کاروانیتر بکەین، ئیتر پارەت ئەوەندە لێ زیاد ئەبێ، خۆت و ماڵ و منداڵت نەتوانن تەواویکەن.. ئەها ئیشی مەترسیدار چەند خۆشە؟

کرمانج: تا ماوم خزمەتکارییت ئەکەم گەورەم، سوپاس بۆ ئەو هەموو متمانەیەی پێت بەخشیم، دڵنیابە وا ئەکەم بەردەوام زیاتر بێ.. ئەی پارەکە کەی ئەگاتە دەستم؟

ڕێشار: پەلەی ئەوەیانت نەبێ، پاشا خۆی بە ڕێگەی تایبەتی خۆی بۆمان ئەنێرێتەوە، بە جۆرێک قەت بە خەیاڵتا نایەت.

کرمانج: بەخوا گەورەم ناتوانم هەرگیز بە چارەکی ئێوەش درک بە ئیشەکان بکەم.

ڕێشار: جا ئێمە بەس هێنانمان لەسەرە، نە کڕیاری بۆ پەیا ئەکەین و نە فرۆشیاریش، بە کورتیی حازرخۆری بەر سێبەرین.. چەند ئاسان گەیشت وا نا؟

کرمانج: هەر زۆر زۆر.

ڕێشار: لەسەیارەکەشدا بگیرایە هی تۆ نەبوو.. کچەکان خۆیان ئەڵێن خۆمان کڕیومانە هههههە، ئیش ئاوا ئەبێ برا.. ئەوە ئەقڵی پاشایە، ئەها چەند گەورەیە...

کرمانج: بە ڕاستی من حەپەساوم، هیچم بۆ ناوترێ.

ڕێشار (( دوای داپۆشینەوەی کارتۆنەکان)): دەی ئێستاش با ئەو هەتیوە حەماڵەکە بێت و بچێ لە دوور فرێیاندا.

کرمانج: ئەی گەورەم بۆ نەیبەمەوە بۆ ژن و ژاڵ؟

ڕێشار: فێربە کرمانج، هیچ بەکارهاتوویەکی ئەم ئیشە لە نزیکی خۆتەوە نەهێڵیت، ئەوە پەنجە مۆرێکە، یا هەڵەیەکە، ئیتر هەر شتێک، وا ئەکا سەرت بدا بە فەتارەیەکا، با حەماڵەکە بیبات و بشگیرێ، ئەو بەرپرسە ئێمە نەبووین هههههه.. بڕۆ بانگیکە.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم، هەر ئێستا.

(( کرمانج ئەچێتە دەرەوە بۆ بانگکردنی خدر، مالە دێتە ژوورەوە))

_____ گەڕانەوەی هەیە _____ Cut _____

دیمەنی – ٣٢٩ – ش/ن - ماڵی زوبێر:

(( بروسک و چیمەن))

چیمەن: ئەرێ باوکم هەر نەهاتەوە، خۆ وتی زوو ئەگەڕێمەوە؟!

بروسک: خەمی باوکت نەبێ، ئەو ئەزانێ چۆن کاری خۆی ڕایی ئەکا، دڵنیابە ئێستا کە گەڕایەوە، ڕێککەوتنێکی وای کردووە لە خەیاڵی هیچمانا نەبێت.

چیمەن: ئەوە ئەزانم، بەڵام تا ئێستا ئەوەندە لە وادەی گەڕانەوەی تینەپەڕیوە، کە وتبێتی سەعات ئەوەندە دێمەوە، تەنها یەکجار چارەکێک و وابزانم دووجاریش ٥ دەقە ٥ دەقە دواکەوتووە، نەک ئاوا سەعاتێک.

بروسک: ماویەتی بۆ سەعات، ڕەنگە پێش ئەوە پەیا بێتەوە.

(( چیمەن ئەچێ لە پەنجەرەکەوە تەماشا ئەکا، بەسەر ئامآژەی دیار نەبوونی ئەکا))

_____ گەڕانەوەی هەیە __________ Cut ________________

دیمەنی – ٣٣٠ – ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( دارەوان گرژەو نارەوەن))

نارەوەن: ئەوە تۆ کەی وا تورەوترۆ بوویت دارەوان؟

دارەوان(( گرژ)): لەوکاتەوەی کە ئەزانم شتم لێ ئەشاریتەوە.

نارەوەن (( شڵەژان)): لە خۆتەوە ئەڕوانیتە منیش.. ئەوە تۆی شت ئەشاریتەوە، من شتێکم نییە بۆ شاردنەوە.

دارەوان: من متمانەی دنیام بە تۆ هەبووە، بەڵام دیارە زۆر بە هەڵەدا چووم.

نارەوەن: لێت قبوڵ ناکەم بوختانم بۆ هەڵبەستی دارەوان.. وریابە ئەمەش دواجارت بێ قسەی وا بکەی.

دارەوان: هەرکەس ئاوا بتبینێ دڵنیا ئەبێت کە شت ئەشاریتەوە، تۆ ڕوخساری خۆتت بینیوە چۆن شین و مۆر هەڵگەڕاوی؟

نارەوەن: بەڵێ هەرکەس بوختانی بۆ هەڵبەسترێ ئەشڵەژێ، من کە هیچ لە خۆما شک نەبەم چۆن بە ئارامیی گوێ لەو قسە بێ سەرەو بەرانەت بگرم.

دارەوان: وا مەزانە کە نایەمەوە بۆ ماڵەوە ئیتر فەرامۆشم کردووی، دڵنیابە ئاگام لە هەموو هەڵسوکەوتێکتە.

نارەوەن: دەی ئەگەر ڕاست ئەکەی یەک تەنها شتم پێ بڵێ کە من کردبێتم و تۆ ئاگادار نەبیت.

دارەوان: پێویست ناکا، خۆت لە من باشتر ئەزانی.

نارەوەن: باوەڕکە ئامادەییم تیایە، لێرەیا ئەم پێکەوە ژیانەمان بوەستێنم، گەر قسە نەکەی!!

دارەوان: ئاوا !!!!!.. تا ئەو ڕاددەیە؟

نارەوەن: بەڵێ زۆر زیاتریش ، من گەر مێرد قسەم بۆ دروست بکا، دڵنیا بە گوو ئەکەمە ئەو ژیانەی بەوجۆرە لەگەڵیا بیبەمەسەر.. بەیانی زوو ئەڕۆیت نیوەی شەو بۆم دێیتەوەو بوختانیش هەڵبەستی؟ ئەوە من نیم، قسە بکە دەی!

تیرۆژ (( بە پەلە دێت)): ئەوە ئەو دەنگە دەنگەتان لەچییە؟ ئێوە کەی وابوون؟

نارەوان: بەڵێ ئەمشەو باوکتان زوو هاتۆتەوە قسەم بۆ دروست بکا.

دارەوان (( زۆر تورە بۆ تیرۆژ)): تۆ بچۆرە ئەودیو، فزەت لێوە نەیەت.

(( تیرۆژ ئەحەپەسێ و ئەڕوات))

نارەوەن: ئەوە چییە کابرا شێت بوویت؟ بۆ وا لەو کچە تووڕە ئەبیت؟ بڵی بیانووتان پێ ئەگرم و ئەمەوێ ماڵەکەتان بۆ جێهێڵم و ژنیتر ئەهێنم.

دارەوان (( تورە)): من لە کردەوە ناشرینەکانی تۆ تورەم، نەک بیانووتان پێ بگرم.. بە چ هەقێک کاتێ من لە ماڵەوە نیم تۆ کوڕێکی گەنج ئەهێنیتە ماڵەوە؟ پێم بڵێ.

نارەوەن (( قاقا پێئەکەنێ)): هههه وەڵا باشە دارەوان ئەفەنی، وتم خوایە ئەبێ چ قسەیەکیان بۆ دروست کردبم؟ هههه ئەمە لە کەیەوە دڵیشت پیس کردووەو ئاگام لێی نییە؟ هههه کاتێ تۆ لە ماڵ نییت پیاو هاتووە بۆ ماڵمان، وەڵا بابە هەر لەمەمان کەم بوو؟! جا پیاوەکە من لە ڕێزەی چییا ماوم دڵپیسکەیت؟ ههههه

دارەوان: ئەوە چییە ئەو پێکەنینە دەستکردە؟ پێم بڵێ ئەو کابرایە کێ بوو؟ چۆن ئەیناسی؟ ئەمە دڵ پیس کردن نیەو باش تۆش ئەناسم، مەبەستم کابرایە کێیە؟

نارەوەن: ئەتوانی تەڵاقەمبەیت، بەڵام لە سەر گۆڕەکەشت نە پێت ئەڵێم کێ بوو، نە پێشت ئەڵێم چۆن پێی گەیشتم، ئەوە ڕزگارکەرەکەی تریفە گیان بوو.. بە ڕێگەی تایبەتی خۆم و بە هەڵڕشتنی پارە بۆ خەڵک، پێی گەیشتم.. تۆ ئازا بوویتایەو پێی بگەیشتیایە، ئەی نەتووت ئەوە ئیشی منەو خۆتانی تێ هەڵمەقورتێنن خۆم ئەیدۆزمەوە؟ ئەی بۆ بۆت نەدۆزرایەوە؟

دارەوان: ئەها فزولێیەتت وایکرد پارە هەڵڕێژی تا پێی بگەی؟

نارەوەن(( جۆرێک لە ڕۆزو خۆ نواندن)): بەخوا من لە منالّییەوە هەر فزولّیی بووم و تازە بۆم تەرک ناکرێ.. ئەوەتا ئاوا سوودم لێی بینی و خۆم ئاسودە کرد.

دارەوان: تەمەنی چەند بوو؟

نارەوەن (( دووبارە ڕۆز)): هەر ئاوا ٣٥ بۆ چل سالّێک.

دارەوان: ئەی نابێ پێم بلّێی؟ تۆ هیچ شتێکت لێ نەشاردوومەتەوە، ئەمەیان بۆ؟

نارەوەن: لەبەرئەوەی هەزار بەلّێن و سوێندی لێوەرگرتم کە بۆ هیچ کەسێکی باس نەکەم.

دارەوان: باشە بە چ مەرامێک ئەوەی کرد؟ ئەوەم زۆر مەبەستە.

نارەوەن: باوەڕ ناکەی پێت بلّێم بە ڕێکەوت دەمانچەی بینیوە بە دەستی ئەو دووانەوەو زانیویەتی نیازی کوشتنی کچەکەیان هەیە.. کاتی خۆی تۆی ناسیوەو ماوەیەکیش لە گەڕەکی خوارەوە بوون، بە گەڕەکدا هاتووەو تۆی بینیوەو مالّەکەی زانیوەو ئەیوت، جارێک ئەم کچەشم بینی لەبەر دەرگاتان بە تۆی ئەوت دایکە..ئاوای وت.. چەند پارەشم بۆ ڕاگرت، هیچی لێوەرنەگرتم.

دارەوان: دلّنیابم؟

نارەوەن: ئەی خۆ دۆستیشم نییە کابرا بۆ وا سەرت لێ شێواوە؟

دارەوان: ئەترسم بکەویتە هەلّەیەکەوە نارەوەن گیان، باوەڕ بکە سلّەمینەوەیە لە تۆ، ئەگینا نە دلّ پیسییەو نە هیچ.

نارەوەن: نا خالّۆ خەمی منت نەبێ، دلّنیابە لە هەر هەمووتان وریاترم.. چاکیش بزانە پارەپەرستێکم یەک دینارم بە خۆڕایی خەرج نەکردووە.

دارەوان: من هەزارجارم پێ وتووی گوێ مەدە بە پارەو چۆنت ئەوێ ئاوا بەکاری بێنە، کەی کێشەی من پارەیە؟

نارەوەن: دەی کەواتە وەک لە پارە ناترسی، لە منیش مەترسە.

دارەوان: مادام هاوڕێی من بووە هەر ئەیدۆزمەوەو ئەیهێنمەوە بەردەمت، کەمێک ئارام بوومەوە، بەڵام مانای وا نییە لەو کارەت بوراوم.. بەڵکو بە دووبارەبوونەوەی خۆت ئەخەیتە تالووکەوە نارەوان.

نارەوەن: هەڵەم نەکردووە، تا بە هەڕەشەکەت بمترسێنی.. لە پێناوی پاراستنی منداڵەکانیشا چاک بزانە هەموو شتێ ئەکەم.

دارەوان: ئەوە پێموتی نارەوان (( هەڵئەسێ)) بۆ هەموو شتێک پرسم پێ ئەکەی.. با نەگاتە تورە بوونی ڕاستیی.. خۆت ئەزانی باوەڕم بە جیابوونەوە نییە. (( ئەچێتە دەرەوە))

نارەوەن: جا بمکوژە، (( دارەوان دیار نامێنێ)) ئەیڕۆ خۆ هەڕەشەی کوشتنم لێ ئەکا !!

Cut

دیمەنی – ٣٣١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٢٩ - ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن و بروسک قەلەقن))

چیمەن: بوو بە سەعات و سێ چارەک.. ئێستا بچین بۆ کوێ؟ لە کێ سۆراخێکی بکەین؟

بروسک: پێی وتووم بۆ کوێ چووە، ناچارم بچم بۆ ئەوێ.

چیمەن: ئەی مۆبایلی بۆ داخستووە؟ کە ئەچێتە شوێنی مەترسیدار.

بروسك: نا مەترسیدار نییە کۆبوونەوەی هەیە. (( دەرگا ئەکرێتەوەو زوبێر دێتە ژوورەوەو چیمەن ڕائەکا باوەشی پیا ئەکا)).. نەموت خەمت نەبێ.

(( بەخێرهاتنەوەو ماندوو نەبوون))

چیمەن: خۆت نازانی من بەرگەی ئەوە ناگرم ئاوا دوابکەوی؟

زوبێر: ئیشەکە ئەوەی پێویست بوو، دڵیشم هەر لای ئێوە بوو.

بروسک: چەند بەلای خۆمانا شکایەوە؟

زوبێر: زیاتر لە چاوەڕوانیی..

بروسک: واو..

چیمەن: سەیارەیەکی تیایە بۆ من، ئیتر کەیفی خۆتانە.

زوبێر: بەسەرچاو بەیانی بچن بیکڕن.. تۆ کەی داوات کردووە تا من بڵێم نا؟..

بروسک: زوو قەناعەتیان کرد؟

زوبێر: پێشبینیی ئیش کردن زۆر لە جێی خۆیا نییە بروسک، هەرکاتێ هەنگاوی یەکەمت دەستپێکرد، هەنگاوەکانیتر ڕەوان ئەبن.. کاتێ ئەگەیتە نیوەی ڕێ بیرت ئەچێتەوە سەرەتا چۆن دەستت پێکرد.. لەبەرئەوە باشترە لە حاڵەتی ئاوادا پێشبینییەکەت ڕێکبخەی بەوجۆرەی تۆ چاوەڕوانی خراپترین هەڵوێستیان بکە، دوای ئەوە هەرچۆنێک دەرچوو، تۆ هەر براوەیت.

بروسک: ئەمە تەکنیکی تازەیە لە پرۆتۆکۆلا.

زوبیر: تۆ زۆر بە قورسیی دائەبەزیت، بەڵام چاوەڕوانییەکەت خراپترینە. کە خراپترینیشت هاتە بەردەم، بە ئاسانیی ئەتوانی بکشێیتەوە.

چیمەن: بۆ هەموو پێشبینییەک؟

زوبێر: نا، ئەمەیان تەنها بۆ ئەم جۆرە بازرگانییەیە، لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانا لقی زۆر لێ ئەبێتەوە، بۆ هەر یەکەیان و هەڵوێستی جیاوازی ئەوێ.

(( دیالۆگ و گوێگرتنی باش))

Cut

دیمەنی – ٣٣٢ – ش / ن – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٢٨ – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار تەنها دانیشتووە.. کارتۆنی جلەکانی ژێرەوەی کچەکانی لێ نەماوە ))

ڕێشار: دواکەوت!.. ڕەنگە ئەو هەتیوە حەماڵەی بۆ نەدۆزرابێتەوە.. یان چاوەڕوانی پۆلیس بکات بیهێنێتە سەرمان.. هەرچۆنێک بێت ئیتر ئەمە دوا تاقیکردنەوەی ئەبێت.

(( کرمانج و خدر دێن و سڵاو، ئەو وەڵامی سڵاوەکە ناداتەوە ))

ڕێشار: درەنگ هاتیەوە؟!

خدر: خەتای من بوو گەورەم لە سەرئاو بووم.

ڕێشار: دەی ملی تۆشکێ.. تۆ بچۆرەوە بەر دەرگا تا بانگت ئەکەمەوە.

خدر: بەسەرچاو گەورەم. (( بە پەلە ئەڕوات ))

ڕێشار(( پاش کەمێک بە دەنگی بەرز )): سەرە.. مالە.. یەکێکتان ئەو کارتۆنانە بێننەوە.

کرمانج: ئەی کارتۆن لێرە نەبوو گەورەم؟

ڕێشار: درەنگ هاتیەوە ئیتر ئەوان پێیان باش بوو خۆیان فڕێیدەن، ئێستا ئەیهێننەوە.

کرمانج: یان تاقیکردنەوەی منە گەورەم هەهە؟

ڕێشار: جا ئەوەش بێ هەر هەقی خۆمانە، ئیشەکە ئاسان نییە کرمانج.

کرمانج: بە دڵی خۆت تاقیم بکەرەوە گەورەم، خەمی منت نەبێ.. دیارە ئەو کارتۆنانەی شتەکەش نەماون.

ڕێشار: تۆ ئیشی خۆت بکەو پرسیار مەکە.. (( هەڵئەسێ )) من ئەڕۆم، کە کارتۆنەکانیان هێنایەوە، بەو هەتیوە بڵێ دوور فڕێیاندا.

کرمانج: فەرمانتە گەورەم.

(( مالە کارتۆنەکان ئەهێنێتەوەو فڕێی ئەداتە سەر زەوی))

کرمانج: دەی با خدر بانگکەم. (( ئەچێتە دەرەوە))

ڕێشار: دەی دەستوبردکەن.. سەرە تۆ دەرگاکان داخەو من مالە لەگەڵ خۆما ئەبەم.

سەرە: فەرمانتە گەورەم.. منیش دواتر دێم.

(( ڕێشارو کرمانج ئەچنە دەرەوەو خدریش شتەکان کۆ ئەکاتەوەو ئەڕوات.. سەرە ئاوێک دەرئەهێنێ و ئەیخواتەوە، دوو کەسی دەمامکدار لە پشتیەوە دێن و دەمانچە ئەخەنە سەر سەری و ئەویتریان لە پشتەوە باڵی ئەبەستێتەوەو دواتر چاویشی ئەبەستنەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٣٣ – ش/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( لە قاوەخانەکەدا هەر دوو سێ کەس هەیەو تریفە لەجێی کاشێرەو باوێشک ئەدات و دەستی خستۆتە ژێر چەنەی.. یەکێک لە کرێکارەکان دێتە بەردەمی))

کرێکار: فەرموو.

تریفە: ئاوا ئیشمان بۆ ناکرێ، بەیانی لە سەعات دوانزەوە ئێرە بکەنەوەو تا سەعات یەک خۆم دێم شتەکان ئامادە بکەن.

کرێکار: درەنگ نابێ؟

تریفە: نا هیچ درەنگ نابێ، لەسەر کارتۆنێکیش کاتی ئیشکردن بنوسن، لە سەعات یەکی نیوەڕۆوە، بۆ یانزەی شەو، لەوە زیاتر ناتوانم.

کرێکار: بەسەرچاو تریفەخان.

(( تریفە سەر ئەخاتە سەر مێزەکە وەک ئەوەی خەوی بێت))

دیمەنی – ٣٣٤ – ش/ن – سەر مێزو کورسییەک لە ژووری پاشا:

(( پاشا/ دارەوان تەنها بە توورەکەیەکی ڕەش سەرو سیمای داپۆشیوە، جووتێ دەستکێشی ڕەشی لە دەستدایە، بەدلەیەکی کرێکاریی یەکسەریی شین.. دەنگی دارەوانەو گۆڕانکاریی بەسەردا ئەهێنێت.. سەرە بە ترسێکی زۆرەوە لە بەردەمیا وەستاوە))

پاشا: تۆ لە هەڵس و کەوتی ڕێشار ڕازیت؟

سەرە: لە ئاستی جەنابتا پاشا گیان درۆو ڕیایی ناکرێت.. ڕاستییەکەی نەخێر.

پاشا: لە چییا بە دڵت نییە؟

سەرە: پاشا گیان بەو خۆدەرخستن و پۆزەی کاک ڕێشارا، هەموو کەسێک ئەزانێ ئێمە خەریکی چیین! خەڵک ڕفاندن ڕەنگە پێویست بێ، بەڵام زۆربێت نا، لە سوچێکەوە هەر ئەدۆزرێینەوەو حکومەتمان لێ تێئەگەیەنن، ئەوسا ئەسڵێ بازرگانییەکەشمان ئاشکرا ئەبێت.. بۆ نمونە کۆمپانیاکەی زوبێر هیچ کەسێک نازانێ ئەو کارانە ئەکەن یان نا، چونکە بێدەنگ و لەسەرخۆو خاکین.

پاشا: ئۆو سەرە، تۆ زۆر لە ڕێشار وریاتری.. ئەو هەرچی من پێی نەڵێم بیکە بە جۆرێک ئەیکا، دڵم خەریکە بتەقێ، درک بە هیچ شتێک ناکا، تۆ بە پێچەوانەوە، ڕای جوانت هەیە.

سەرە: دەستت ماچ ئەکەم پاشا گیان، گەورەیی جەنابتە.

پاشا: زۆر باشە، ناو بەناو تەلەفونت بۆ ئەکەم سەرێکم لێ بدە.. بەهیچ جۆرێک لای هیچ کەسێک ئەم باسە ناکەیتەوە، چونکە درکاندنی بەرامبەر بە ژیانتە.. خۆت بەلاواز نەزانی سەرە کە وا بە ئاسانیی باڵبەست کرایت و هێنایانی بۆ ئێرە، ئەو کوڕانەی لای من لەسەر کوشتن و ڕفاندن مەشقیان کردووە.

سەرە: تا جەنابتم بینی هەستم کرد بۆ کوشتنم ئەبەن، بە ناسینی جەنابت دڵنیا بوومەوە.

پاشا: ئاگاداری درکاندنی ئەم یەکتر بیننە بە. خۆت ئەزانی چۆن چاودێریی ئەکرێی.

سەرە: من پێی گەورە بووم پاشا گیان، چۆن نهێنیی جەنابتم لێ ئەکەوێ؟ ئەوە مەحاڵە.

پاشا: ئێستا بچۆرەوە خزمەتی ڕێشارو تۆ هەر پاسەوانە هیچ نەزانەکەی.

سەرە (( هەڵئەسێ)): بە دڵنیاییەوە پاشا گیان.

(( سەرە ئەیەوێ بڕوات و پاسەوانێکی دەمامکدار، دێت و هەردوو چاوی ئەبەستێتەوەو پێش خۆی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ٣٣٥ – ڕ/ د – لە قەراغی شۆستەیەک:

(( نارەوەن لە سەیارەکەیدایە.. تێل ئەکا ))

خدر (( دەنگ )): بەڵێ لە شوێنی ئیشم.. بەس دانیشتووم ئیشم نییە.

نارەوەن: ئەگەر ئەتوانی بگەڕێیتەوە، زۆر باشترە.

خدر: ئەمر ئەکەی. سەرچاو، وا ئەچم بۆ لای ماڵەوە.

نارەوەن: منیش دێم بۆ ئەوێ.

(( نارەوەن ئەڕوات ))

Cut

دیمەنی – ٣٣٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشارو کرمانج و هەندرێن و بێستان و تافان دانیشتوون))

ڕێشار: ئێوەش ئەزانن لەم ماوەی ڕابردوودا نەمانتوانی سوود لە بوونی ئێوە وەرگرین لە کۆمپانیاکەیا، هەر گلەییەکیشتان هەیە، ئەوە بە کرمانج بڵێن با جێبەجێی بکا.

هەندرێن: هەر موچەکەیەو هیچیتر.

ڕێشار: تۆ جارێ هەفتەیەکت تەواو نەکردووە لێرە، مووچەی چی؟ بەڵام بۆ ئەوەی بێدەنگ بن مووچەی ئەم مانگەشتان هەمووی بۆ خەرج ئەکەم، کرمانج بیاندەرێ.. دەبڕۆن خواحافیزتان بێ.

بێستان: سوپاس بۆ ڕەوشتی بەرزتان لەم ماوەیەی پێکەوە بووین.. خواحافیز.

(( ڕێشار خۆی مەشغوڵ ئەکا بە ئاو خواردنەوەوە.. کرمانج، هەندرێن و بێستان و تافان پێش خۆی ئەدات، ئەوان خواحافیزیی ئەکەن، بێ ئەوەی وەڵام بدرێنەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٣٧ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ هەندێک مشتەری لایەو خدر لە ناکاو دێتە ژوورەوەو سڵاو و ئەچێتە لای هاوڕێ))

هاوڕێ: ئەم پەلەکڕوزەیەت لە چی؟ یاڵڵا خێر؟

خدر: ماڵێکی باش، ئەگوێزنەوە، پێیان وتووم دوو سێ پارچەی قورسیان هەیە، بۆیان بارکەم و دایگرمەوە. هەر کەس هەواڵی پرسیم بڵێ ڕەنگە نیوەڕۆ بێتەوە، خوا ناردویێتی.

هاوڕێ: خوا نەیبڕێ، پێت وتوون بە چەند دێم؟ ماڵی وا هەیە ممنونن تا ئیشەکەیان تەواو ئەبێ.

خدر: کورە نەبابە هەموو شتێکم بڕانەوە، خوا نەیبڕێ لێرە باشترە.

هاوڕێ: دەبڕۆ خوات لەگەڵ، خەمت نەبێ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر))

Cut

دیمەنی – ٣٣٨ – ڕ/ د – ناو سەیارەی نارەوەن لە ڕۆشتندا:

(( بە مۆبایل))

نارەوەن: تۆ گەیشتوویتە ماڵەوە ................ دە دەستوبردکە، سەیارەیەک دەمێکە بەدواماوەیە، تا سەری لێ ئەشێوێنم یان دڵنیا ئەبمەوە دوای من نەکەوتووە، تۆش پێ هەڵگرەو لە ماڵەوە بە .......................... دەی باشە.

(( ماوەیەک ئەڕوات و سەیارەکەی دواوە بە لایەکیتردا ئەڕوات و نارەوەن ئاماژەی ئاسوودە بوون ئەکا))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٣٣٩ – متبوع – ڕ/ د – ناو سەیارەکەی نارەوەن:

Mute

(( دیمەنێک یان دوو دیمەنی نارەوەن لە سەیارەکەدا نیشان ئەدرێ، تا نارەوەن ئەگاتە بەر دەرگای ماڵی خدر.. ئەبینێ دەرگا کەمێک کراوەتەوەو سەیارە ڕائەگرێت و دائەبەزێ و ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٤٠ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ڕێژوان:

(( سەلواو ڕێژوان))

ڕێژوان: ئەوە کێشەی خانوومان نەما، لەخوا بەزیاد بێ، زوو هاتە دەست. ئێستا بچین بۆ ئالْتون و جل.

سەلوا: من یەک مسقالْ ئالْتون چییە نامەوێ.. سەد جارم پێ وتی.

ڕێژوان: کچێ کەرانی باوکم بۆت ئەکڕێ، دوایی هەرکاتێک پێویستمان نەبوو ئەیفرۆشینەوە، ئیتر بۆ لە دەستی منیشی ئەدەی؟

سەلوا: من حەزم بە کەمفرسەتیی نییە، با یەک پرسیار بکەم.

ڕێژوان: فەرموو.

سەلوا: داوای هیچ شتێکت لە باوکت کردووەو وتبێتی نەء؟ مەبەستم شت کڕینە.

ڕێژوان: نا بەس ئەمەیان شتێکیترە.

سەلوا: هیچ شتیتر نییەو بە ڕاستیی بەویش ئەڵێم کە نامەوێ.. خۆت ماندوو مەکە، ئەچین بۆ جلەکان و بڕایەوە.

ڕێژوان: نابێ، لەبەر خەڵک هەر زۆر عەیبە، من شتی وا ناکەم، دواتر خۆم ئەچم ئەیکڕم، ئەتوانی دوایی بیفرۆشیتەوەو پارەکەی بدەیتەوە بە باوکم.

سەلوا: بە گاڵتەی مەگرە، دڵنیابە ئەیکەم.. دە خۆت چی ئەکڕی بیکڕە، بەس جارێ با بچین بۆ جلەکان.

(( دایالۆگیتر، تا لە شوێنێک ئەوەستن))

Cut

دیمەنی – ٣٤١ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( چاخانەکە چۆڵە، کەسی تیا نییە، ئەردەڵان دێت))

ئەردەڵان: خوا بازاڕت با.

هاوڕێ: وەڵا ئیتر وا ئەیبینی.

ئەردەڵان: ناشوکر مەبە.. ئەها هەر وام پێ ئەڵێی؟

هاوڕێ: نا نا ئەمڕۆ باش بوویت.

ئەردەڵان: جا ملۆزمەکە باری باشتری دەسکەوتبوو، لێرە نەبوو.. تۆی داماویش دیارە چاخانە لە تەنیشتتەوە کراوەتەوە.. ئا چایەکم بەرێ.

هاوڕێ (( ئەچێ بۆ چا تێکردن)): نا نا چاخانە نەکراوەتەوە، بەڵام هەموو ڕۆژێک ئێرە لەم کاتەیا چۆڵ ئەبێ، یان هەر یەک دوو کەسێکی لێ ئەبێ.

ئەردەڵان: ئەزانم، گاڵتەت لەگەڵ ئەکەم، بۆ بووی بە کابرا هەموو شتێ بە جددی وەرئەگری هههههە.

هاوڕێ: ئای خوایە تۆ ڕقت لە کابرایە هههههە.

(( ئەردەڵان چاکەی ئەخواتەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٤٢ – ڕ/ن – ماڵی حەمە خدر:

(( خدر بە جلی ئیشەوە.. نارەوانیش بەرامبەری یان لە نزیکییەوە، بە پێی پێویستیی دەرهێنان، دانیشتووە))

خدر: ئەی چۆن؟

نارەوەن: مەبەستت ئەوەیە دڵنیا بوویتەوە کە دارەوان و ڕێشار پەیوەندیی زۆر باشیان هەیە؟

خدر: دادە گیان، هەروەک پاراستنی کچەکەی، ڕێشار ماڵەکەشی بۆ ئەپارێزێ، واتە ماڵی دارەوان.. ئەو ماڵەی بەرامبەرت سیخوڕیت لەسەر ئەکەن بۆ ڕێشار، ڕێشاریش ئەیگوێزێتەوە بۆ دارەوان، دەنا ئەو لە کوێوە زانی، من هاتوومە ماڵی تۆ؟

نارەوەن: واو زۆر ڕاستە.، ئەی پێمنەوتی هەڕەشەی کوشتنی لێکردم، دیارە خراپ تێیان چاندووە.

خدر: وایە.. ئەوجا کە ناهێڵێ ئەو دوو کرێکارەی قاوەخانەکەش دەربکرێن، بە بیانووی پاراستنی تریفەوە، هیچ ئەسڵی نییە.

نارەوەن: وەڵا لەوەشیان دڵنیام.

خدر: ئەی ئەو دووە، پیاوی ڕێشارن، مانای چییە بەدیار کچەکەتەوە بن؟ ئەی ئاو کڕین لە ڕێشار؟ کە هیچ مانایەکی نییە.. ڕەنگە لە کارێکدا شەریک بن، نازانم چییە.. ئەبێ وردتر قسەیان لێدەربێنین، بە تایبەت لە تریفە، چونکە وائەزانم ئاگای لە هیچ نییە.. مێردەکەی نا، وریابە.

نارەوەن: با تریفە ببینم! بزانم وا بکەم وردەکاریی کڕین و فرۆشتنم بۆ باس بکاو ئیشی ئەو دووانەو شاگردەکانی تریش.

خدر: لە خۆشیی هاتنت هەر بیری ئەوەم نەبوو پێت بڵێم دوێنێش دنیایەک جلی ژێرەوەی بۆ کچەکان کڕی و دواتر لێی وەرگرتنەوەو دای بە من فرێیدەم هەههەه.. منیش ئەیکەمە دیاریی بۆ تۆ.. دڵنیام ئەوەش نهێنییەکی گەورەی تیایە.

نارەوەن: چۆن؟

خدر: ئەی بۆچی بۆیان ئەکرێت و بۆ لێیان وەرئەگرێتەوە؟ جاری پێشووش کە لێی وەرنەگرتنەوە، بۆ چاوبەستی خەڵک بوو.

نارەوەن: ئادەی با بزانم جوانن؟

خدر: ئەچم ئەیهێنم، خۆ هەر لە ژووری نوستنەکە دامناوە. (( ئەڕوات))

نارەوەن (( تا خدر ئەگەڕێتەوە، خەریکی ڕێکخستنی قژ و خۆ چاککردن ئەبێ و خدر دێتەوە)): ئەڵڵاهـ ئەو هەمووە؟

خدر: پیرۆزت بێ.. هەڵبەت ئەمانە گرانیشن؟!

نارەوەن (( سەیریان ئەکا)): هەر زۆریش.

خدر: بۆ ئەم هەموو شتە گرانبەهایەیان بۆ ئەکرێت و بۆ لێیان وەرئەگرێتەوە.. تۆ سەر لەمە دەرئەکەی؟

نارەوەن (( تەماشای ژێرەوەی یەکێک لە کارتۆنەکان ئەکا، وەک شتێکی دۆزیبێتەوە)): ئا وەرە خدر، وەرە.

# (( ئەڵقەی حەڤدە))

خدر: چیت بینی؟

نارەوەن: دیقەتی ئەم تەنیشتانەی کارتۆنەکە بدە، ترنجاوە.. وەک بەزۆر جێی شتێکی تیاکرابێتەوە.

خدر: ئەی سەیریکە جلەکانیش چەند زۆرن؟

نارەوەن: نابێ.. ئەمانە پێکەوەن، خۆ یەک یەک نەیکرپیوەو تێی ترنجاندبن، ئەها ئەها سەیری ئەم پارچەیەکە، ئەم پارچەیە جێی جلەکانە، چەند بە جوانیی و بە بێ زەخت لێکردن دانراوە؟ کاکە ئیشی شەریکە ئاوایە.

خدر: جا مەبەستت چییە؟

نارەوەن (( تەماشای دەرەوەی کارتۆنەکەش ئەکا)): ئەم کارتۆنە بە نایلۆن داپۆشرابوو، وەک شەریکە کردبێتی؟

خدر: بەڵێ، یەکەمجار کە وتیان بیخەرە سەیارەی کچەکانەوە، بەنایلۆن و ساف ساف داپۆشرابوو، بێ عەیب.

نارەوەن (( کەمێک ڕەشایی وەک جێی سوتاندن ئەبینێتەوە)): ئەی ئەم جێی سوتانە ئەبینی؟

خدر (( دیقەت ئەدا)): وایە ئەوە جێی سوتاندنە. بەس من تێ ناگەم ئەتەوێ بڵێی چی؟

نارەوەن: ئەوە مانای ئەوەیە ئەم کارتۆنە بەرگەکەی شەریکەی نەماوەو دواتر بەرگی تێ گیراوەتەوە.

خدر: جا گەر واش بێ چییە؟

نارەوەن: هەی فەرقۆس، ئەوە یەعنی بەرگە ئەسڵییەکە لێکراوەتەوەو لەژێر ئەم جلانەیا شتێکیتر بە زەخت دانراوەو دواتریش بەرگەکە دانراوەتەوە.. جا کە ئەو شوێنەی (( پەنجە بۆ سوتاوییەکە درێژ ئەکا)) بەریداوە، هەوڵیانداوە بیسوتێنن، تا یەک بگرێتەوە.. تۆ سەیریکە، ئەم جلانەو جێگە ئەسڵییەکەی نیوەی کارتۆنەکە ئەبن و نابن، ئەی نیوەکەیتری؟(( دەستی ماچ ئەکا)) مەکە شێت و وێت.

خدر: نیوەکەیتریشی لە ژێرەوەیەو بابەتی قاچاخە.. ئادەی با موکیاجەکانیش بێنم!!! یەک دەقە (( خدر ئەڕوات بۆ ماکیاژەکانی جاری پێشوو، نارەوەنیش هەر دیقەتی کارتۆنەکان ئەدا))

________ گەڕانەوەی هەیە ______________ Cut __________________

دیمەنی – ٣٤٣ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێر و دارەوان دانیشتوون))

دارەوان: بەڵام کرێیەکی زۆر باشیان داناوە، دەستخۆش، بەوە ئیشەکەمان ڕێچکەیەکیتر ئەگرێ.

زوبێر: ئیتر هەندێ وردەئیش کەم بکەینەوە، ئەوپەڕی ئەمانپەرژێتە سەر دوو ئیشی وا.

دارەوان: ئەگەر ٤ ئیشی واشمان بێتە پێش، ڕەتی مەکەرەوە، خەڵک ئەهێنین و دایئەمەزرێنین.

زوبێر: جارێ بڕیار وایە تەواوی سەوزەی ناوچەکەمان بدەنێ، دوای ئەم دانەوێڵەیە.. وتیشی جگە لە گواستنەوە، وەکالەتێکی سەرەکیی ئازوقەشتان ئەدەینێ، بەڵام هەر یەکەو ڕێککەوتنی تایبەتی ئەوێ.

دارەوان: کورە وا مەڵێ زوبێر! ئەوە ئەبێتە ئیشی تەمەنی خۆمان و ماڵ و مناڵیش.. من بۆ ئۆفیسی سەرەکیی وەکالەتەکە یەکێک دائەنێم، کە خۆت داوات لێکردم بێت لێرە ئیش بکا.

زوبێر: جارێ ئەوەیان ماویەتی، هەنگاوی داهاتووە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٣٤٤ – ڕ/ن – ماڵی هەڵشۆ:

(( هەڵشۆو تریفە بە جلیماڵەوە، هەڵشۆ نان ئەخوات و تریفە چای بۆ خۆی تێکردووە))

هەڵشۆ: چی بوو کردت بەڕاست؟

تریفە: ئەی خۆ داروبەرد نییم، ناتوانم بە تەنیاباڵ هەر ئەوەندە دەرەقەت دێم.

هەڵشۆ: عەننابییە، با هیچ نەبێ لە شەو و ڕۆژێکدا سەعاتێک یەکتر ببینین.

تریفە: ئەی بۆ عەننابیی نییە بۆ تۆ بەقوربان؟ توخوا بەس پێم بڵێ بەم ڕۆژگارو شەوگارە تۆ خەریکی چیت، ئەوە سێ سەعات باوکم تۆ بڵێ چوار سەعاتیش لە مەعرەز بوویت، ئەی دوای ئەوە، نە خۆت و نە هیچیشت دیار نیین.

هەڵشۆ: چۆن هیچم دیار نییە بەساقە، من ڕۆژانە دەسکەوتی زۆر باشم هەیە.. هاکا لەپڕێکا بینیت هەڵشۆی مێردت ئەبێ بە یەکێ لە گەورە سەرمایەدارەکانی وڵات.. ئاگات لەچییە؟

تریفە: ئای کە نایبینم.. بەخوا تۆ یا قومار ئەکەی، یا ئافرەت و مافرەتت هەیە خوا پێم نەگرێ، ئیتر نازانم.

هەڵشۆ: ئەیبینی چەند عەننابی ئەبێ!! ئەوسا ئەڵێی چەند زۆرزان بوویت!.. بۆ داهاتی قاوەخانەکەت کەمە خانم؟ وا چاوت لەدوای ئەوەی منە؟

تریفە: چاوم لەدوای هیچی تۆ نییە، بەڵام خۆ کفر نابێ ئەگەر دوای مەعرەز بێیتەوە قاوەخانەکەو سەعاتێ پشوو بدەی بە من.

هەڵشۆ: ناگونجێ کەسەکەم ناگونجێ.. ئەگەر دەستی بدایە هەڵبەت وام ئەکرد.

تریفە: کێشە نییە، مادام بۆ من نییت، یاڵڵای ئەکرد سەرت بە هەزارەوە ئەنا.

هەڵشۆ: تۆ ئەوەندە دڵ پیسیی وا ئەزانی هەڵشۆ هیچ ناکا پارە لە ئافرەتا خەرج ئەکا.. زۆر سەهووی تریفە گیان، ئەوە هەڵشۆ نییە.

تریفە: ئیتر بۆ هەر شوێنێک ئەچی کێشەی من نییە، من وا جارێ چارەسەری خۆم دۆزیوەتەوە، هەر کاتێکیش بەمەش دەری نەهێنا، کچێکی باش ئەدۆزمەوە هاوکاریم بکا، تۆم هەر نەویست، برۆ، بۆ کوێ ئەچی بچۆ، نەوەڵا هیچ باکم نییە.

هەڵشۆ: دەی مادام ئاوا ئازادت کردم و دەستت لێ بەرداوم، نانی ئێوارە مەخۆ، دێم بە شوێنتاو ئەچین بەیەکەوە نانێ ئەخۆین.. عەننابییە وا نا؟

تریفە(( هەڵئەسێ بۆ ژوورێکیتر پشتی لە هەڵشۆیە)): نەوەڵا نە عەننابییەو نە قوزەڵقورتیش بە پارەی تۆ ئەخۆم.. نەیەی، خۆمان خواردنمان لایە.

Cut

دیمەنی – ٣٤٥ – ڕ/ د – دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( تەنها ئامۆ لە دوکانە، شەنیا دێتە بەردەمی دوکانەکە، ئامۆ تەماشای ئەکا، شەنیا سەرنجی ناداتێ و تەماشای کەلوپەلەکانی دەرەوە ئەکا ))

شەنیا: هێی دوکاندار!

ئامۆ(( دێتە دەرەوە )): هێی کڕیار فەرموو!

شەنیا(( دیقەتی ئەداو تاس ئەیباتەوە بۆ کەمێك، بەدەنگی کچانەی ئاسایی )): ببورە تۆ خاوەنی ئێرەی؟

ئامۆ: بەڵێ من دوکاندارم.

شەنیا: ببورە، نەئەبووایە وا بانگت بکەم، دروستە.

ئامۆ: کێشە نییە فەرموو.

شەنیا: ڕاستییەکەی بۆ دوو گڵۆپی درێژ هاتم.

ئامۆ: نیۆن؟

شەنیا: نازانم ئەوەی ماڵان.. بەڵام ئەم شتانەم بینی هەست ئەکەم پێویستیم بە هەمووی هەبێ.

ئامۆ: یەعنی هەموو دوکانەکە؟

شەنیا: ئیتر ئەوەی پێویستم بێ.

ئاوا(( دێتەوەو شەنیای پێ جوان ئەبێ )): تۆ بچۆ ژوورەوە ئامۆ گیان، وا خۆم هاتمەوە.

شەنیا(( ئامۆ ئەچێتە ژوورەوە )): تۆ خاوەنی ئێرەیت یان ئەو کوڕە.

ئاوا(( وەک بۆی بکاتەوە )): بەڵێ گیان، فەرقمان نییە، ئێمە براین، ئەو ئامۆو منیش ئاوا.

شەنیا(( بەدەمی جوڵەیەک ئەکا وەک چوک و بەدڵ نەبوون)): وتت تۆ کاک ئاوەدانیت؟

ئاوا: نەخێر گیان، ئاوا.

شەنیا: شتەکانت بەکەڵک نایەن.

ئاوا: ئەی گیانەکەم، تۆ خەریکی کڕینیان نەبووی لەگەڵ ئامۆدا؟

شەنیا: نا تۆ گیان زۆر سەرف ئەکەی، بای!

ئامۆ(( شەنیا ئەڕوات و ئامۆ دێتە دەرەوە)): چی بوو؟

ئاوا: دادم منی بەدڵ نەبوو، دیار بوو ئەیویست لەگەڵ تۆیا پێکبێ.

ئامۆ(( تورەو دەست ڕائەوەشێنێ)): ئۆوهۆووو تۆش لە بەزمی خۆت ناکەوی؟!

Cut

دیمەنی – ٣٤٦ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٤٢ – ماڵی حەمە خدر:

(( نارەوەن و خدر، دیقەتی پاکەتی ماکیاژەکان ئەدەن))

نارەوەن: ئاگات لێیە ماڵەکەم؟ ئەیبینی؟

خدر: بەڵێ ئەمانیش هەر نیوەن، بە تایبەت ژێرەوە بەتاڵە.

نارەوەن: کەواتە ئەو بێویژدانانە ئیشی قاچاخچێتیان بەم چەتیوانە کردووە.. ئەبێ دووریان بخەینەوە.

خدر: تۆ ئێستا لە ژێر چاوی دارەواندای دڵنیابە، ناکرێ هیچ جوڵەیەک بکەی.

نارەوەن: تۆ بڵێی بزانێ دێمە ماڵەکەی تۆ؟

خدر: دوور نییە.

نارەوەن: مەمتۆقێنە خدر گیان.. بەخوا گەر لەگەڵ ڕێشاردا دەستیان تێکەڵ بێت، دوور نییە سەریشمان نەپەڕێنن، تۆش ئەزانی چەند دڕندەن.

خدر: ئەی چۆن؟ ئەبێ چارەسەرێکیتر بۆ یەکتر بینین بدۆزینەوەو کەسیش نەمانبینێ بەیەکەوە.. خۆت ئەزانی چی ڕووئەدا!

نارەوەن (( کەمێک ڕامان)): باشە، ئەتوانم شتێکیتر بکەم.

خدر: ئادەی!

نارەوەن: ماڵی کەژاڵی خوشکەزام لەناو بازاڕە.. ئەچم سەیارەکە لای ماڵی ئەوان دائەنێم و خۆم بە بیانووی شت کڕینەوە بە وریایی دێمە ناو بازاڕو کە دڵنیابووم کەسم بەدواوە نییە، بە تەکسییەک دێم، تۆش لە گەڕانەوەیا تەکسیم بۆ بێنە بەردەرگاو ئەهـ .

خدر: ئەوە زۆر باشترە لەوەی سەیارەکەت لەمناوە ببینرێ.. بەڵام ئەزانی تۆ کە دێیت چەندمان پێ ئەچێ تا لە قسە ئەبینەوە؟ (( پێکەنین)) هەردووکیشمان سوێر قسەین هههە.

نارەوەن: نا ئیشەکە وا پێویست ئەکا هههههە.

خدر: ڕاستیەکەی ئیشەکەمان پیرۆزە، ئەی نابینی ئەمڕۆ دەستم لە چاودێریی و ئیشیش هەڵگرتووە بۆ هەواڵی نوێ؟ هههە

نارەوەن: ئا باسی ئیشت کرد.. پێیان وتووم بۆ ئیشێک بەڕێوەبەری دایەنگەی مناڵان.

خدر(( بە سوعبەتەوە ئەمر کردن و پەنجە ڕاوەشاندن)): ئەسڵەن ناچی بەلایا، مەگەر ئیتر بەس لە عوتڵەکانا بتبینم، شتی وا نییە، نایکەی. تێگەیشتی؟ هههە، هەرچی ئیش هەیە پەکی ئەکەوێ.

نارەوەن (( هەڵئەسێتە سەرپێ و تحیەیەکی بۆ ئەکا)): فەرمانتە گەورەم.

خدر: ئەی دەعوەتەکە کەی؟

نارەوەن: ئەمجارە بە بێ سەیارە دێم و ئەچین بۆ ئەو شوێنەی دڵمانی پێ بکرێتەوە.. دە هەستە بۆ تۆش درەنگە، سەعات یەکە، خۆت بگۆڕەو با نزیکت بخەمەوە.

خدر: نا من جارێکیتر بە جلی حەماڵییەوە لەگەڵ تۆیا نایەمە دەرەوە.. (( نامەیەک دەرئەهێنێ)) تۆ با بیرم نەچێ، ئەم نامەیەی پێ بگەیەنە.. ئەوەی ئەمڕۆش بە ناوی خۆتەوە تێی بگەیەنە.. با چالاکیمان وەک یەک بێ.. ڕاستیەکەشی زیرەکییەکە هی خۆت بوو.

نارەوەن(( نامەکە وەرئەگرێ)): زۆر باشە یەعنی لەگەڵما نایەی؟

خدر(( زەنگی مسجی مۆبایل، ئەیخوێنێتەوە)): هەستە پەلەکە بابڕۆین(( ئەچێ دەمانچەیەک دەرئەهێنێ))

نارەوەن: ئەوە چییە چی ڕوویدا؟

خدر: منیش نازانم، بەڵام داواکراوم سەرپەرشتی شوێنێک بکەم و لەوناوەبم.

نارەوەن: با منیش بێم، چۆن هەر بە خۆت ئەکرێ؟

خدر(( خەندەو دەست ئەدا بەشانیا )): نا دایکە ڕوحەکەم، هەڵبەتا خەڵکێکی لێیە، من سەرپەرشتی ئەو خەڵکە ئەکەم.

نارەوەن: هەتیوە حەماڵە شتە زلەکان دەرنەچی لە دوواییا؟

خدر: نا هەر ئەمجارەیە، ئەویش لەبەرئەوەی شارەزای ئەو دەوروبەرەم و بەڕاستی ناشزانم جارێ چییە، ڕەنگە هەر چاودێریش بێ، با بزانین چی دەرئەچێ؟ گرنگ ئەوەیە چالاکییەک هەیە.

نارەوەن: ئەبێ زۆر ئاگات لەخۆت بێ، نەک زۆر مەترسیدار بێ.

خدر: زۆر دڵنیابە هەر بەم جلانەوەو بە شاراوەیی ئیشەکان ئەکەم، حەزم بە کەش و فش و خۆدەرخستن نییە، من هەر حەماڵەکەم.

نارەوەن: ئەی کەوایە چەک بۆچی ئەبەی؟

خدر: نەک شتەکە گەورە بێ و پێویستیم پێی بێ.. خێرا با بڕۆین.

(( پێکەنین بە حەزەرەوەو دیالۆگ لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ٣٤٧ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( ڕێشار دانیشتووەو کرمانج و سەرە بە پێوەن))

ڕێشار (( بۆ کرمانج)): ئەمڕۆ باری ئاوەکەمان هەیە.. کرمانج خۆت بچۆ سەرەوکاریی بکە، سەرە تۆش ئەو دوو کارتۆنەی لێرە بردت، بە جیا بیدە بە کرمانج، با تێکەڵ بە ئاوەکانی بکا، وریابن کەسیتر نەیبینێ، ئەم ئیشە تەنها لەو دووەتان بەرپرسە.

کرمانج: بەڵێ گەورەم بێخەمبە.

ڕێشار: زۆریشیان بۆ بار مەکەن، هەر ٥٠ کارتۆنێک، یان بیست کارتۆنێک بەسە، گرنگ ئەوەیە ئەو دوو کارتۆنەی تیابێت.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم، خۆیان هەرچەندیان داواکردو جەنابت ئەمرت بە چی بێت هەر ئەوەیە.

ڕێشار: باشە دەی خۆم دوایی سەرێکیشتان لێ ئەدەم.

کرمانج: لە خزمەتداین.

ڕێشار: تۆ بڕۆ کرمانج.. سەرە وەرە دانیشە.. ئیشم پێتە.

(( چونە دەرەوەی کرمانج و دانیشتنی سەرە لە میوتیدا دیالۆگی بە چپە))

Cut

دیمەنی – ٣٤٨ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان و سەلواو ڕێژوان))

ڕێژوان: باشیەکەی لەوەدایە بێ کێشە هاتنە دەرەوە.. ئەگەر خۆتان داوای وازهێنانتان بکردایە، هەزارو یەک بڕوبیانووی ئەهێنایەوەو ڕەنگە ڕازیش نەبووایە.

سەلوا: بەڕای من کەس نازانێ خێر لە چییایە!

تافان: زۆر ڕاستە وایە، هەر دوور کەوتنەوە لەو بەدفەسساڵە خێری گەورەیە.

ڕێژوان: من ئەمە بە باوکم ئەڵێم.. ئەویش بزنسێکی گەورەی بەدەستەوەیەو ئەمڕۆ یەکەم کاروانی ئێمە ئەڕواو هی ئەوانیش بڕیاروایە بێت.. ئیشەکە پێویستیی بە کارمەندی زۆر هەیە.. دڵنیام ئەو دووەتان، ناوی یەکەم و دووەم ئەبن.

هەندرێن: ماڵی تۆو باوکیشت ئاوا بێ، پەک ناکەوێ ئیشەڵڵا.

ڕێژوان (( هەڵئەسێ)): جا من چۆن ئەهێڵم پەک بکەوێ.

(( سوپاس و موجامەلە سەلوا نەبێ))

سەلوا: بۆ کوێ وا زوو؟

ڕێژوان: سەرێکی باوکم و کۆمپانیا ئەدەم.

هەندرێن: باشە ئێوارە لێرەی.

ڕێژوان: ئاخر عەزێت مەکێشن توخوا..

(( بەڕێکردن و دووپات کردنەوەی ئەوەی ئێوارە ڕێژوان بێتەوەو خواحافیزیی.. دواتر))

تافان: کچێ تۆ ئەم نیعمەتەت لە کوێ دۆزیەوە باوانێکتە.

سەلوا: بەخوا ئەو منی دۆزییەوە، من ئەوم نەدۆزیوەتەوە هههە.

Cut

دیمەنی – ٣٤٩ – ڕ/ن – سەربانی کۆمپانیای زوبێر:

(( ناناسرێتەوە کە سەربانی کۆمپانیاکەیە.. پاشا بەمۆبایل قسە ئەکا.. دەستکێشی ڕەش دیارەو دەموچاوی دیارنییە))

پاشا: هەڵەت کرد ڕێشار هەڵەبوو.......... بەرگری لە خۆت مەکە، من وتم تەنها ئەو دوو کارتۆنە بسوتێنن لە ماڵی حەماڵەکەدا ئەگەر فرێی نەدابوون، پێم نەوتی گەر لە ماڵەکەیدا بوو ماڵی بسوتێنن............گوێ بگرەو پاکانە مەکە، بەڵێ بەهۆی لاسارییەکانتەوە، باش گوێ لە من ناگریت و بە هەڵە تێئەگەی........... زیاترم بۆ مەڕێسە، ئەو حەماڵە بانگ ئەکەیت و وەک دڵدانەوە، هەر خەسارەتێکی لێکەوتووە بۆی ببژێرە.. پێی ناڵێی من ماڵەکەتم سوتاند.. بڵێ تۆ کەسێکی باشیت و لەگەڵمانا بەدڵسۆزیی کارت کردووە، پێم ناخۆشە هەرچی ڕەنجت هەیە با بیبات، ماڵەکەت هەرچییەکی تیابوو، من بە زیادەوە بۆت ئەکڕمەوە............ تا سبەی نیووەڕۆ ئەمە جێبەجێ ئەکەیت............ قسەیترم ناوێ و بیبڕەوە.

(( هەر تەنها دەستی بەدەستکێشەکانەوە دەرئەکەوێت کە مۆبایلەکەی دائەخاتەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٥٠ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

Mute

نارەوەن لە سەیارەکەی دائەبەزێت و چەند عەلاگەیەک وەک بازاڕی کردبێ، لە سەیارەکە دایئەگرێت و ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٥١ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و بروسک و ئەردەڵان و چەند کۆمبارسێک ))

ئەردەڵان: ئەی کاکە ڕاستیان وتوە تەماع سەری نەخۆی سەرت ئەخوا.. ئەی نەئەبووایە ئاگای لەماڵەکەی بێ؟

هاوڕێ: دە چەڵتە چەڵت توخوا، بۆ تۆ ئێستا ئەزانی ماڵەکەت چی بەسەرهاتووە؟

بروسک: کە نازانی قسە بکەی، نەیکەی باشترە.

هاوڕێ: من ئەمڕۆ بیستم وتیان ماڵی هەموو حەماڵەکانی ئێرە سووتێنراوە، ئەوە دڵم نەهات پێت بڵێم.

ئەردەڵان: هھە، وەڵا هیچ باکم نییە بسوتێنرێ!

بروسک: کەس هەیە باکی نەبێ ماڵی بسوتێنرێ؟

هاوڕێ: هھھە ئەی هەر دەستێ نوێنی تیایەو تەواو، ئەویش ئەوەندە چڵکنە هەر باوەڕ مەکە گڕ بگرێ.

ئەردەڵان: دەی ئاخر من قسە نازانم یا ئەم گەوجە؟ ئێستا ئێمە خەمی حمەخدر بخۆین، یان دانیشین خەریکی گاڵتەوگەپی خۆمان بین؟

بروسک: با جارێ من بچمەوە مامم و ئەوان ئاگادار بکەمەوە.

Cut

دیمەنی – ٣٥٢ – ڕ / د – بەردەمی دوکانی ئامۆ:

(( ئەحە بە ڕاکردن ئەڕوا، ئاوا بە پێوەیە لەبەر دوکانەکە))

ئاوا: ئەوە چییە ئەحە؟ ئەو فڕکان فڕکانەت لەچییە؟

ئەحە: کورە ماڵی مام سوتێنراوە.

ئاوا: کێ؟ حمەخدر؟

ئەحە: ئا ئا مامە حمەخدر.

(( ئاوا ئەچێتە ژوورەوە بە ئامۆ بڵێت))

Cut

دیمەنی – ٣٥٣ – ڕ/ ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو دارەوان و بروسک))

زوبێر: گروپێکی پیاوکوژو خوێنمژ هەن، لە هیچ شتێک ناسڵەمنەوەو سنوریان نییە.

دارەوان: بەڵێ زۆر ڕاستە، ئەبێ حەماڵێکی داماو چی کردبێ ماڵی بسوتێنن؟

بروسک: ڕاپۆرتەکەی پۆلیس ئەڵێ ژوور بەژوور سوتێنراوە، واتە کەس ناتوانێ بڵێ شۆرتی کارەبایە هههە.

زوبێر: بروسک، وەک هاوسۆزیی شتێکی باشی بۆ خەرجکە.. داماوە بە کۆڵکێشان ئەو پارەیەی کۆکردووەتەوە. وابێت جێیەکی بۆ پڕ بکاتەوە.

دارەوان: زۆر چالاک و گورج و گۆڵە، وەڵا بابە منیش شتێکت ئەدەمێ، ئەوەشی بدەرێ.. جا ئەوە نارەوەن ئەڵێ کە داوای حەماڵم کرد، لەو خدرە زیاتر کەسیترم بۆ مەنێرە.

زوبێر: هەر ماندوو بوون نازانێ چییە، بەدەم هەمووانیشەوە ئەچێ.

بروسک: لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە، تورەبوون لە مەزەبیا نییە.

دارەوان: کاکە کەسێک نارەوەن لێی ڕازی بێ، مانای وایە دەموچاویش نایا بە یەکا، نەک تورە بوون هههە.. دڵنیام ئەویش پارەیەکی ئەداتێ.

(( دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٣٥٤ – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( خدر بێتاقەت.. بە ملکەچیی لەبەردەم ڕێشاردا وەستاوە، کرمانجیش بە پێوە))

ڕێشار: گومانت لە کەس نییە خدر؟

خدر: گەورەم ئەبێ حەماڵێکی داماوی وەک من کێ دوژمنی بێ تا گومانی لێ بکەم؟ ئەوە پۆلیسیش ئەو پرسیارەی کرد، وتم نەوەڵا گومانم لە هیچ کەسێک نییەو باوەڕ ناکەم کەسێک سوتاندبێتی، ڕەنگە خۆی گڕی گرتبێ.

کرمانج: ئیتر ئەوەش ئەبێ، ڕەنگە بە هەڵەش سوتابێ خدر، وانییە؟

خدر: هەموو شتێک ڕێی تێ ئەچێ.

ڕێشار: کرمانج هەر ئێستا بچۆ چەند کرێکارێکی باشی بۆ بنێرە بۆ خانوەکەی با خۆی لەگەڵیانا بچێ، تۆ مەچۆ.. با سەرەتا خانوەکەی پاک بکەنەوەو بیشۆن.. دواتر هەر ئەمڕۆ باشترین بۆیەچیی بۆ بنێرە خانوەکە تازە بکەنەوە.. هەرچییەکیش لە ماڵەکەیدا هەبووە، بە زیادەوە، بە شتی باشترەوە بیخەنەوە شوێنی خۆی.. خدر ڕاستە من کەمێک ڕەقم و بەرەو ڕوو وەسفت ناکەم.. بەڵام تۆ باشترین حەماڵی ئەم دەوروبەرەیت و ناهێڵم زیانت پێ بگا.

خدر: گەورەم لە ڕایی خوا، تۆ بۆ ئەو زەرەرە بگریتە ئەستۆت؟ نەبەخوا قبوڵی ناکەم.

ڕێشار: کرمانج ئەوەی پێم وتی بە پەلە جێبەجێی ئەکەیت، نامەوێ بگاتە دوانزەی شەو، ئیتر تێبگە.

کرمانج: بەسەرچاو گەورەم ئەمرەکەیت.

خدر: مەعز بۆ ڕەزای خوا گەورەم.

ڕێشار: فلّتە فلّت هەتیو.. بڕۆن و تەواو.

(( مینجە مینجی خدرو چوونە دەرەوەی لەگەڵ کرمانج))

Cut

دیمەنی – ٣٥٥ – ڕ/ د – بەر دوکانی ئامۆو ئاوا:

(( ئامۆو ئاوا وەستاون))

ئامۆ: زوو ئەگەڕێمەوە، هەر ئەو ٥٠٠ دۆلارەی ئەدەمێ و ئیتر ئیشم نییە.

ئاوا: سەلامی منیشی پێ بگەیەنە. پێی بڵێ هەموو کارەباییاتی ماڵەکەی لەسەر خۆمان، بۆ هیچ شوێنێک نەچێ بۆ کڕینی شتی کارەبایی، وەستاکەشی هەر خۆمان بۆی ئەنێرین.

ئامۆ: باشە، پێی ئەڵێم ئەگەر قبوڵی بکا.

(( ڕۆشتنی ئامۆو ئاواش ئەگەڕێتەوە بۆ ناو دوکانەکە))

Cut

دیمەنی – ٣٥٦ – ڕ/ن – ماڵی دارەوان:
(( نارەوەن بە مۆبایل))
نارەوەن (( شڵەژاو)): ١- ئەوە بەڕاستتە؟ ........ ٢- کوێراییان دایەت باشە؟ خەمت نەبێ بەقوربان، خەفەتی لێ نەخۆی هەموویت بۆ وەکو خۆی لێ ئەکەمەوە........ ٣- ئەها کە پیاو خۆی باش بوو، هەموو کەسێ لە خەمیا ئەبێ، زۆر دڵنیابە هەموو باشیی خۆتە هاتۆتەوە ڕێت، ئەی خۆ من بە خۆڕایی لە یەکەم ڕۆژەوە هەڵمنەبژاردووی؟ ئەزانم چ مەعدەنێکی پاکت هەیە.. ئەوە منیش دیاریی خۆم هەیە، با سوپرایز بێ خۆشترە بە تەلەفون پێت ناڵێم.. ئەی کەی چاکی ئەکەنەوە؟............ ٤- ئابزانە یەکێکیش ماڵەکەی من ناسوتێنێ خدر گیان؟ هههە وەڵا باوکم وابزانم ماڵێکت بۆ ئەکەن لەوی من خۆشتر.. ئەی باشە ئەم ڕێشارە بۆ وا ڕەحمی تلیساوەتەوە ئەگەر دەستی خۆی تیانەبێ؟ ...... ٥- دەباشە بەساقەوبم ئاگات لە خۆت بێ، ئەزانم زۆر سەرقاڵی، با کاتت نەگرم........ ٦- دەستت خۆش بێ کوڕم وەڵا باشت کرد چاوەکەم.. دەبڕۆ با فریاکەوی، دڵم لاتە، هەر دەرفەتێکت بوو تا سەعات یانزەش تێلم بۆ بکەرەوە....... ٧- خوات لەگەڵ، خوا ئاگادرت بێ.
(( نارەوەن خەندەیەک و مۆبایل دائەخاتەوەو لە شوێنێک دایئەنێ و ئەچێتە ژوورێکیتر))
______________ Cut ______________

دیمەنی – ٣٥٧ – ڕ/د – شوێنێک لە دەرەوە:
(( خدر بە مۆبایل))
خدر (( ماندوو)): ١- ئەرەوەڵا یەک پرپۆڵم بۆ دەرنەچووە......... ٢- هەر تۆ خۆش بیت نارەوەن خان خەمی چی؟ خەڵکیش زۆر هاتنە پێشەوە، ڕێشار چاک کردنەوەی هەر هەمووی بە کەلوپەلەکانیشەوە گرتە ئەستۆی خۆی.. کاک دارەوان و کاک زوبێرو زاواکەی، نزیکەی پێنج هەزار دۆلاریان بەزۆر دا بەسەرما.. کوڕەکانت ٥٠٠ دۆلارو هەموو ئیشی کارەباییاتی، وتم سوپاس، چونکە ڕێشار وتی هەمووی خۆم ئەیکەم، ئینجا کاک حەمەومین ٢٠٠٠ دۆلارو کاک فریا ١٠٠٠ دۆلارو کوڕە چوزانم هەموو گوزەرەکە هاوکارییان کردم، خوا نەیبڕێ خۆم ٣٠٠٠ دۆلارم سوتا لە ماڵەکەیا، بە هەر هەموویان نزیکەی ١٠٠٠٠ دۆلار زیاتریان بۆ ناردووم و ماڵەکەشم لە جاران بۆ جوانتر ئەکەنەوە، وا خەریکی ئیشن تیایدا لە بۆیە کردنەوەیان........... ٣- تۆ باسی دیاریی هەر مەکە.. ڕێشار پێی وتن، تا سەعات دوانزەی شەو ئەبێ وەک خۆی لێ بێتەوەو خۆشتریش.. پارەی ژوورێکی نوستن و مەتبەخێک بە هەموو پێداویستییەکانییەوەو ژوورێکی میوانی زۆر نایاب.. چوار دەست نوێنی تەواو و تەلەفزیۆن و سەتەلایت و زۆر شتی تریش کە نەمبوون، کرمانج یەکێکی لەگەڵا ناردم بە دڵی خۆم هەڵمبژاردن و پارەکەشی درا.. شەویش بۆم ئەهێننەوە ماڵەوەو ڕێکیشی ئەخەن. هههەهە ..... ٤- کچێ بێدەنگبە داروديوار گوێی هەیە.. دوایی خۆم و خۆت بە درێژیی باسی ئەکەین.......٥- ئەرەوەڵا هەر خەریکی ڕاکەڕاکم، لەم دوکان بۆ ئەو دوکان بۆ ماڵ و بۆ بازاڕو ئیتر بووم بە سەگی پێ سوتاو، وتم با هەر تۆش ئاگاداربی باشترە....... ٦- باشە من بەساقەوبم ڕێزی زۆرم بۆت هەیە.. جارێ لەسەر ئیزنت خواحافیز........ ٧- سوپاس خوا ئاگاداری تۆش بێت.
______________ Cut ______________

دیمەنی – ٣٥٨ – ڕ/د - کۆمپانیای ڕێشار – مخزن:

(( کرمانج بەدیار بارکردنی چەند کارتۆنە ئاوێکەوە وەستاوە، دوو کرێکارەکەی قاوەخانەکە بۆی هاتوون.. سەرە دوو کارتۆنەکەی بۆ ئەهێنێ.. دوو کارتۆنەکە هەروەک ئەوانیتر داپۆشراون))

سەرە: گەورەم وتی ئەمانە بخەنە ژێرەوە.

کرمانج: باشە بەسەرچاو.. ئەی چەند کارتۆن بار ئەکەن؟

سەرە: شەست.

کرمانج: دەی جارێ دووان ڕۆشتووە، بیدە بەو کرێکارانە با داینێن.. ئەوانیتریش بخەنە سەری.. بەس تۆزێک لە قەراغی هەردووکیان بنوشتێنەرەوە با دیاریی بن.

سەرە: بۆ؟

کرمانج: دەی با دیاریی بن لەوێ.

سەرە: تا ئێستا شتی وامان نەکردووە، قەیچێکا با ئەمجارە وابێ.

(( چەند کارتۆنێکی کەم بار ئەکرێ))

——— گەڕانەوەی هەیە ——— Cut ———

دیمەنی – ٣٥٩ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆ بە تەلەفون))

سەرکۆ: دەستخۆش.. ئەوە زۆر باشە............. کۆلانی F ت بیر نەچێ........ بەڵێ زۆر گرنگە.......... بەسەرکەوتوویی بتانبینمەوە.. چاوەڕوانی هەواڵتم سات بەسات......... بەڵێ کات لای خۆتانە.............. سەرکەوتن.

(( تەلەفون دائەخاتەوەو سەرقاڵە))

Cut

دیمەنی – ٣٦٠ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر:

(( دارەوان  بە پێوەیەو زوبێر دانیشتووە))

زوبێر: تەلەفونیان کردەوە کارڕایی ئیداریی وەکالەتەکە بکەین، کەمێکیتر نوێنەریان ئەگات، جا تۆ وەک پشکەکانت بە ناوی نارەوەنەوە لێرە تۆمارکردووە، با هەر خۆی کارڕاییەکەش بکات و وا باشتریشە خۆی ئەو ئیشە ڕاپەڕێنێ، هەست ئەکەم نە من و نە تۆ نامانپەرژێ.

دارەوەن: جا ئەو هەواڵەی پێ بڵێم شاگەشکە ئەبێ هههە، منیش پێم خۆشە، دوور ئەبێ لە منەوە ههە، لەو بڕوایەدام زۆر بە خێرایی ئەوە ئەکا.. ئێستا تێلی بۆ ئەکەم بێت بۆ ئێرە... سوپاس بۆ متمانەشت.

زوبیر: سوپاسی ناوێ دارەوان گیان، ئەو خۆی شەریکە ئەسڵییەکەمە هههە تۆ نوێنەری ئەویت.

دارەوان: هەهە ئەی وایە.. دەی من بچم ئەوەی پێ بڵێم.

زوبێر: باشە خوات لەگەڵ.

(( ڕۆیشتنی دارەوان و خۆ سەرقاڵکردنی زوبێر))

Cut

دیمەنی – ٣٦١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٥٨ – کۆمپانیای ڕێشار- مخزن:

(( نزیکەی ٢٠ کارتۆنێک بارکراوە، سەرە وەستاوەو کرمانج و دوو کرێکارەکەش دوو کارتۆن ئاویان هەڵگرتووەو نزیک ئەبنەوە لەوەی باریکەن.. کرمانج، شاور/ فیکەیەک دەرئەهێنێ))

سەرە: ئەوە چی ئەکەی؟

کرمانج ((شاورەکە ئەبا بۆ دەمی)): ئەم حەماڵانە زۆر خاون، دوو حەماڵی تایبەتمان هەیە بانگیان ئەکەم.

سەرە: گەورەم پێی خۆش نابێ ئەوە پێموتی.

کرمانج: دوایی قسە ئەکەین (( دوو فیکە لەسەر یەک لێئەدات و کۆمەڵێک ئاسایش دێنە سەر بارەکە..

# (( ئەڵقەی هەژدە ))

کرمانجیش دەمانچەیەک دەرئەهێنێ و ئاراستەی سەرەی ئەکا..))

کرمانج: ئا ئەو دوو کارتۆنەی ژێرەوە دەربێنن کە لۆیەکی نوشتێنراوەتەوە.

ئەفسەری یەک نەجمە: فەرمانتە گەورەم.

سەرە: ئاوا کرمانج؟ گەورەی خەڵکیشیت؟ کوا فەرمانی دادوەر بۆ پشکنین؟

(( ئەفسەرەکە نیشانی ئەدا ))

کرمانج: من ڕائید کۆژینم کاکە سەرە، کە تائێستاش نازانم تۆ ناوت چییە.

ئەفسەر(( دوای پشکنین )): گەورەم هیچی تیانییە، هەر ئاوە.

کرمانج: چیت لێکرد سەرە؟ ئەو تلیاکەت بۆ کوێ برد؟

سەرە: تلیاکی چی ئاگام لە هیچ نییە.

کرمانج(( پشتەملی سەرە ئەگرێت و دوو کرێکاری قاوەخانەکە ئەداتە پێش)): ئەمانە بخەنە سەیارەکەوە، دەرچن بۆ پشکنینی ئەم دەوروبەرە، خێرا.. (( بۆ هەندێکیان)) لەگەڵما وەرن بۆ کۆمپانیا، بە وریایی، ئەمین نییە.

(( بەرەو کۆمپانیا ئەچن))

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٣٦٢ – متبوع – ڕ/ن – کۆمپانیای ڕێشار:

(( کرمانج و ئاسایشەکان لە ڕاڕەوەکەوە ئەچنە ژوورەکەی ڕێشارەوە، ڕێشار پاڵیداوەتەوە))

کرمانج: ڕێشار کۆکایینەکەت بە سەرەیا بۆ کوێ نارد؟

ڕێشار: کۆکاینی چی و تەڕەماشی چی؟ ئێوەم نەنارد ئاو بارکەن؟

کرمانج: کاتی فرتوفێڵ بەسەرچوو، پێم بڵێ چیت لێکرد؟ ئەگینا خراپت بەسەر دێت.

ڕێشار: ئەوەیان هیچ کە کەس ناتوانێ خراپ بەسەر من بێنێ، بەڵام تۆ تێمگەیەنە، ئەوان ئاسایشن و تۆ پیاوی بەردەستی منی، بۆ تۆ لێپرسینەوە ئەکەیت؟ ئەڵێی ڕێشارت نەناسیوە کرمانج.

کرمانج: وریابە هەر شتێک بڵێی لە دژت بەکار ئەهێنرێ، تۆ دەستگیر ئەکرێی بە فەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە، ئەتوانی لەوێ بەرگری لەخۆت بکەیت.

ڕێشار(( هەڵئەسێ)): هەهە دیارە کردتتان بەڕاست.. مادام دادوەری تێکەوت، من هیچ قسەیەکم لەگەڵ تۆدا نییەو هیچیش لە خۆما شک نابەم، بفەرموون بۆلای دادوەر.

کرمانج: ئەم ژوورەو هەموو ژوورەکانیتریش بپشکنن.. مالە لەکوێیە ڕێشار؟

ڕێشار: تەنها ئاگام لە خۆمە، نازانم ئەوانیتر لە کوێن.. خۆ بەدوای قنگیانەوە نییم.

Cut

دیمەنی – ٣٦٤ – ڕ/ د – شەقامی گشتیی:

(( نزیکی کۆمپانیای ڕێشار، مالە بە سەیارە بەرەو کۆمپانیا ئەگەڕێتەوە.. کە پۆلیسەکان ئەبینێ، ئەگەڕێتەوەو ئەو دەوروبەرە جێ ئەهێڵێ))

مالە: ئای خوایە! بەخوا وا بزانم ئەمە ڕۆژە ڕەشەکەیە کە لێی ئەترساین!

Cut

دیمەنی – ٣٦٥ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان و بروسک و چەند کەسێکیتر لەوێن، قەرەباڵغیی هەیە، دارەوان دێتە ژوورەوەو دیقەتی قسەی خەڵک ئەدا ))

ئەردەڵان: ئەی وایە کاکە وا ئەزانن حوکمەت خەوی لێکەوتووە.

هاوڕێ: هەتیو بە عالەمی ئاشکرا خەڵکیان بەرشەق ئەداو ئەیانبرد.

بروسک: ئای ئەو ڕۆژە چییان لەو داماوە نەکرد لێرە؟ دیاربوو هەر ئیشی ئەوانە.

هاوڕێ: هەر حسابیان بۆ کەس نەئەکرد بابە!!

ئەردەڵان: هەرچی ئەتواری ناشرین بوو ئەو جەماعەتە دڕندەیە نواندیان.

هاوڕێ: ئەشهەدوو دڕندە بوون.. مافیا بوون مافیا.

دارەوان: ئەوە چی ڕوویداوە بروسک؟ ئەو هەموو ئاسایش و پۆلیسە چین؟

بروسک: قوربان گیان ڕێشارو گروپەکەی فت، حوکمەت لرفیدان.

دارەوان: گیران؟

ئەردەڵان: ئیشەڵڵا لە سێدارەش ئەدرێن، تلیاکیان پێ گیرا.

دارەوان(( بۆ بروسک)): ئەوە ڕاستە؟

بروسک: بەڵێ.. کرمانجەکەی لەگەڵ خۆیانا بوو دەرکەوت ئەفسەری ئاسایشەو خۆی ئاگاداری هەموو شتێک بووە.

دارەوان (( خەندەو دائەنیشێ.. )) : دەی دەی ئەم بەزمە خۆشە.. کرمانج ئاسایش دەرچوو؟

هاوڕێ: ئەرەوەڵا نەک هەر ئاسایش، ئەفسەری گەورەش.

Cut

دیمەنی – ٣٦٦ – ڕ/ د – سەر ڕێگای گوندێک – جادەی خۆڵ:

(( مالە بەو ڕێگایەدا ئەڕوات و زەنگی بۆ دێت))

مالە: ئەلو!

دەنگ: پاشا ئەڵێ بە پەلە بێتە شوێنی دیاریکراو و خۆمان ئەتبەین بەرەو لای ئەو.

مالە: ئاخر من کەمێک دوورم.

دەنگ: بە چەندیتر ئەگەیتە ئەوێ؟

مالە: بەلانی کەمەوە نیوسەعات.

دەنگ: ئێمە چل دەقەیتر دێین بە شوێنتاو هەڵتئەگرین.. دوانەکەوی لەوە زیاتر.

مالە: چل دەقە ناخایەنێت.

(( دەنگ نامێنێ))

مالە: پاشا هەموو شتێ چارەسەر ئەکا، یەک دنیا شتی زل زل ئەناسێ، تا زووە بیگەمێ.. ئەگەر هیچ ڕوونەدا، قەت هیچیتر ڕوونادا، حەتمەن وایە.

(( پێچ ئەکاتەوەو بە هەمان ڕێگەدا ئەگەڕێتەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٦٧ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی خدر:

(( چەند کەسێک کەلوپەلی ناوماڵیان پێیەو ئەیانەوێ بیبەن بۆ ماڵی خدر))

خدر: کاکە دابنێن، خۆ بۆیەکە وشک نەبۆتەوە ئێوە خەریکی چین؟ بۆ وا بە پەلەپەل هێناتان؟

یەکێک: ئەی خۆ هەر ئەبێ بیهێنین!

خدر: جا خۆ ڕێی لێ نەگرتبووم؟ (( مسجێکی بۆ دێت)) گوێ بگرن.. ئەم شتانە هەر لێرە دانێن با خەسار نەبێ، ئەوانیتر بخەنە شەو، یان بەیانی، من ئیشم هەیە ئەبێ بڕۆم.

یەکێک: شەو لەوێ نابین، بەیانی ئەیهێنین.

خدر: دەی خواتان لەگەڵ. (( ئەوان ئەڕۆن و خدر تێل ئەکا)) باشی نارەخان گیان؟

نارەوەن: من باشم ئەی تۆ؟

خدر: کاتی قسەم نییە جارێ، بە پەلە ئەو دوو کارتۆنەکەی ڕێشارم فریاخە، داوای ئەکەن.

نارەوەن: هەر ئێستا ئەیگەیەنمە دەستت لە ماڵەوە بە.

Cut

دیمەنی – ٣٦٨ – ڕ/ د – شەقامی گشتیی:

Mute

(( دارەوان بە سەیارەکەی خۆی کەمێک بە خێرایی ئەڕوات و تێل ئەکا، یەک دووجار حاڵەتی مەترسییدار ڕوو ئەدا، وەک شێلان و بەرکەوتنی خەڵک و عمود یان سەیارەیتر))

Cut

دیمەنی – ٣٦٩ – ڕ/ن – ژووری ڕائید کۆژین/کرمانج:

(( ڕائید کۆژین لەسەر کورسی و مێزی خۆیەتی.. ڕێشار لەسەر کورسییەکی تەنیاو ڕاهۆز لە تەنیشتی کرمانج/کۆژینەوە لێکۆڵینەوە ئەکا ))

ڕێشار: من بە هیچ شتێک تۆمەتبار نیم گەورەم.. نە بارەکە هیچتان تیا دۆزیوەتەوەو نە لە ماڵەکەم و نە لە کۆمپانیاش، ئیتر چۆن ئەوان هەر بە زۆردارەکیی تاوانێکم بەسەرا ئەسەپێنن؟

ڕاهۆز(( تەماشای بەردەستی ئەکا)): پاشا کێیە ڕێشار؟

ڕێشار: چوزانم، ئەگەر مەبەستت پاشای سعودیەیە، ئەوا هیچ دەربارەی نازانم.

ڕاهۆز: ئێمە بەڵگە نامەکان کۆئەکەینەوە بۆ لێکۆڵینەوە، دیسپلینی داوەریین، بە ئەدەبەوە قسە بکە.

ڕێشار: ببورە بەدەمما هات.

کرمانج: ئەو پاشایەی خزمەتکارەکەتی کوشت و بە تۆی وت متمانە بە من بکەیت لەگەڵ کچەکانا بێم بۆ مەرز.. ئەو پاشایەی لە خۆت زیاتر ناهێڵێ کەس ئاگاداری ناردنی تلیاکەکە بێت بۆ قاوەخانەکەو ئەو پاشایەی پێی وتی تلیاک لە دیاریی ئەو کچە گێژانەیا بشاریتەوە؟

ڕێشار: ئەم قسانە هیچی ڕاست نیین و ئەم ئەفسەرە ڕکەبەرایەتیم ئەکا لەبەرئەوەی خۆی هەژارەو من دەوڵەمەند.. جگە لەوەش شتێک لە یاسا ئەزانین برا، ئەو کە دژی منە، ناکرێ لێکۆڵەرم بێ یان دۆستی لێکۆڵەر، ئەبێ بکشێتەوە. بەڵام ئەگەر ئەتوانێ یەک بەڵگەش پێشکەش بکا، بۆ هەر قسەیەکی؟ هەر قبوڵمە.

ڕاهۆز: ئەو پیاوە نوێنەریی دادپەروەرییەو کار بۆ خەڵک ئەکا، ڕکەبەرایەتیی کەس ناکا.. تەنها حەقیقەت ئەڵێ و هیچیتر.. ئەوە ڕائید کۆژینە.. شایەتی سەر کردەوە قێزەونەکانتە.

ڕێشار: گەورەم ئێستا سەردەمی تەکنەلۆژیایە، ئەو ئەفسەرە نهێنییە ئەیتوانی بە هەر جۆرێک بێت دەنگم تۆمار بکا.. کە نەیکردووە، مانای وایە قسەکانی دروست نیین، بە پێچەوانەوە ئێستا من گومان ئەکەم ئەم خزمەتکارەکەی کوشتبم.

کرمانج: هەهە من خزمەتکارم کوشتووی یان پاشاکەت؟

ڕێشار: ئەوە تۆ پاشا پاشات لە چییە گەورەم؟ ئەتەوێ هەر بە زۆر پاشام بۆ دروست بکەی؟ من خۆم پاشای خۆمم و کەس بە سەرووی خۆم نازانم یاساو دادوەریی نەبێ.. تۆش لێکۆڵینەوەم لەگەڵ مەکە، ئەگینا بێدەنگ ئەبم تا پارێزەرەکەم دێت، یان ئەبرێمە بەردەمی دادوەری لێکۆڵینەوە.

کرمانج: وەڵا بابە باشە.. خۆ تاوانباریشمان ئەکا؟! ئەی بۆ خەریک بوو بە پەتەکە بمخنکێنی؟ هەر گومان کردنت نەبوو لە من؟

ڕێشار: گەورەم تۆ سوعبەتیشت لێ بە ڕاست گەڕاوە؟.. ئەوە سوعبەت بوو چ پەیوەندییەکی بە گومانەوە هەیە ئاهـ برا لەم خەڵکە.. بۆ ئەوەی تۆمەتێکت بەسەرا ساغکەنەوە، چۆن شتەکان ئەگۆڕن.

ڕاهۆز: ئەو کچانەت بە چ مەبەستێ دامەزراندن و پاش کەمتر لە مانگێ دەرتکردوون؟

ڕێشار: گەورەم ئەتوانی داوای لیستی کارمەندانی پێشنیاز کراوم بکەیت کە ژمێریارو گەنجینەم هەیە.. ئێ وا بیرم کردەوە کە من خۆ قوتابخانەی کوڕانم دانەناوە، تا هەر پیاو دامەزرێنم.. ئەو دووانەشم دامەزراند، کە تۆماری دەنگییم لایە یەکێکیان حەزی لەم ڕائیدە بەڕێزە کردبوو، ئەویتریشیان لە خۆم.. بۆیە هەستم کرد کار باش ناڕوات و خراپ ئەشکێتەوە ئیزنمدان.

ڕاهۆز: ئەو تۆمارەت لایە؟

ڕێشار: ئەیچۆن گەورەم؟ خۆ لە چاخی بەردینا ناژین؟ هەر شتێکی گرنگ ئەبێ تۆمار بکرێ، ئەگەر ڕاست بێ.. تەنانەت ژنەکەی ناوی تافان بوو، شەوێکیان تەلەفونی بۆ کردم و بە جۆرێک باسی ئەوەی ئەکرد کە تەڵاقی خۆی وەرگرتووە، وەک ئەوەی من

داوای ئەوەم لێ کردبێ.. هەر زۆر خراپ وەڵامم دایەوەو لەو ڕۆژەوە بیرم لە دەرکردنیان کردەوە.. ئەوەش هەر تۆمارکراوە گەورەم.

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ٣٧٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( نارەوەن و زوبێر دانیشتوون، دڵخۆشیی دیارە))

نارەوەن: بە دڵنیاییەوە ئیشێ ژن بیکا پاکترو خێراترە ههههه

زوبێر: بەڵێ منیش لەگەڵ ئەوەدام کاتێ پیاو لێی ئەدرێ توشی شکستێکی ڕاستەقینە ئەبێ و تێک ئەشکێ، بەڵام ئافرەت بەرەنگار ئەبێتەوە، لەبەرئەوەی ڕوحی بەرەنگاربوونەوەی تیایە.. بەڵام بەوجۆرەش خۆت هەڵمەکێشە نارەوەن.. ئەمە شەیتان بازاڕە، سەرکەوتنت مسۆگەر نییە.. سەرکەوتنەکەت زیاتر لەوەدایە، جگە لە چارەکە بەشی خۆت، کرێی بەڕێوەبردنیش وەرئەگری.. ئەمە وەک سەرەتا.

نارەوەن: نا کاک زوبێر، من پێشنیازێکم هەیە گەر ڕازی بێت، سوپاست ئەکەم.

زوبێر: فەرموو نارەوەن، پێشنیازەکانی تۆ بەردەوام لەجێی خۆیدا بوون.

نارەوەن: زۆر سوپاس کاک زوبێر گیان.. داوات لێ ئەکەم چارەکێکیتر لە بەشەکەی تۆش بفرۆشین بە کەسێک، کە خۆی دەرچووی ژمێریارییە لە پەیمانگەو پارەی ئەوەشی هەیە بەشداریمان بکات..

زوبێر: ئەوە ناگونجێ نارەوەن.. من ناتوانم پشکی ئەم کۆمپانیایە بە هیچ کەسێکیتر بفرۆشم.. ببورە.

نارەوەن: جا کێ باسی پشکی کۆمپانیای کردووە، منیش ئەو بڕیارەتم پێ خۆشە.. من تەنها وەکالەتەکەم مەبەستە... بە ناوی هەرسێکمانەوە تۆمار بکرێ، نیوەی جەنابت و نیوەکەی تریش من و ئەو.

زوبێر: ئەی بۆ تەنها بە ناوی خۆتەوە نەبێ.. من متمانەت پێ ئەکەم و هەڵبەت ئەو کەسەش کە ناوی نابەیت و شەڕی لەسەر ئەکەیت ههههه ئەویش متمانەت پێ ئەکا.. ئەویتری بە بەڵێننامەیەک لە نێوانی خۆمانا ئەینوسینەوە.

نارەوەن: قبوڵە.. ئەویش متمانەم پێ ئەکا.

زوبێر: ئەی ئەکرێ ئەو شەریکە ڕوح سووکەم بناسم کە نارەوەن ئەوەندە مەبەستیەتی؟

نارەوەن: دڵنیام پێت سەیر ئەبێ کاکە زوبێر.. بەڵام دڵنیابە لە تواناکانی، من خۆم ئەوەم تیایا دۆزیوەتەوە، هەم وریاو زیرەک.. هەم سەردەرکردووی بازاڕیش.

زوبێر: واو.. ئەو نازدارە کێیە؟

نارەوەن: حەمە خدر.. ئەمەوێ ئیتر پشوو بدات و ژیانی بگۆڕم.

——— گەڕانەوەی هەیە ——— Cut ———

دیمەنی – ٣٧١ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی خدر:

(( خدر لەبەردەرگا وەستاوەو تێل ئەکا، وەک تەلەفون بۆکراو داخرابێ، جارێکیتر ئەیکاتەوەو سەربائەدات))

خدر(( لەبەرخۆیەوە)): ئای خوایە ئەبێ سوپرایزەکەی چی بێت؟ ئەگەر ئەوە بێت کە خۆم ئەمەوێ زۆر زۆر دڵخۆشم ئەکا.. تۆ بڵێی وابێ؟.. بۆ نا؟ با بزانین، مادام پارە نەبێ، هەر ئەوەیە.. کورە ئاخر نابێ، نەبەخوا چۆن ئەوە ئەکا، قەینا زۆری خۆش ئەوێم، بەس ئەوە نە بۆ خۆی و نە بۆ منیش دەست نادا...... دەی ئاخر کێ بینیویەتی حەماڵێک بە سەیارەوە بچێ بۆ حەماڵیی؟ هههههە.. وەڵا زۆرم حەز لێیە، بەس هەرگیز قبوڵی ناکەم، نەبەخوا، گەر وتی سەیارەت بۆ ئەکڕم یان ئەگەر پارەکەشی دابێت ڕەتی ئەکەمەوە.. زۆر دواکەوت، ئەوانیش زۆریان پەلەیە.

Cut

دیمەنی – ٣٧٢ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٦٩ – ژووری کۆژین/ کرمانج:

(( ڕاهۆزو کرمانج و ڕێشار))

ڕاهۆز: ئەو دیارییانەی بۆ ئەو دوو کچەت کڕی هەموو ژێرەکەی پڕ کرابوون لە کۆکایین و کراک.

کرمانج: چییە حاشا لەمەشیان ئەکەی کە نیشانتدام؟

ڕێشار: گەورەم ئەم قسەیە ناڕاستەو گەر ئەم ئەفسەرە بەڕێزە ئەو هەواڵەی گەیاندووە، لە دوژمنایەتیی زیاتر نییە.

ڕاهۆز: گەورەم.. سیفەتە ڕەسمییەکەی ئەفسەرێکی نهێنییەو لای تۆ کاری کردووە بەئاگاداریی بەرپرسە باڵاکانیش.

ڕێشار: گەورەم ئەکرا کە دیارییەکانم بۆ کڕین، هەواڵی بگەیاندایەتە بەڕێزت و ئەو کاتە بەسەر ئەو ماددەیەوە کە بە ژیانم نەمبینیوە بگیرامایە.. یان ئەوەی بۆ چی بوو؟ هەر خۆی بیگرتمایە مادام ئەفسەری نهێنیی بوو.

کرمانج: خۆت هەموویت ڕیز نەکرد لە کارتۆنە ئاوەکەیا بە بەرچاوی خۆمەوە؟

ڕێشار: مۆبایلت پێ بوو، وێنەیەکیت بگرتایە گەورەم.. ئەوەش نا بچوکترین بەڵگەم بدەرێ، گەر دروستکراویش بێ من ملکەچم.

ڕاهۆز: گەورەم! کارتۆنی شتەکان ماوە بینێرین بۆ پزیشکی دادوەریی؟

کرمانج: نەخێر نەقیب ڕاهۆز ماڵی حەماڵەکەشی پێوە سوتاندو دوایی بۆی دروست کردەوە.

ڕێشار: نەخێر کارتۆنێکیان ماوە لای کچەکانە..(( بۆ ڕاهۆز)) گەورەم ئەم قسەیە چەندی بەچەند؟ ماڵی حەماڵەکەی سوتاندو بۆی کڕیەوە! ئەمە ڕێک یەعنی دوژمنایەتیی کردن.

ڕاهۆز: ئەی بۆچی ماڵت بۆ حەماڵەکە کڕیەوە؟

ڕێشار: من دڵم باشە گەورەم، ئەو پیاوە ماوەیەکی زۆرە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە خزمەتمان ئەکا، گەر بهێڵم بێ لانە بێ، ئیتر لەبیری ماڵدا ئەبێت و وەک جاران کار ناکا، مشوری خۆمم خوارد زیاتر نەک ئەو.

ڕاهۆز: بۆچی کارتۆنێکی دیارییەکان لای کچەکانەو ئەوانیتر لای حەماڵەکە؟

ڕێشار: گەورەم من کە دیارییم بۆ ئەکرین دوای پشکنینی سەیتەرەکان بۆ ئەوەی نەوترێ هەڵپچڕاوە، خۆم سەیرم ئەکردنەوە.. یەکەمیان کارتۆنێک موکیاج بوو کە سەیرم کردەوە هەردووکیان وشک ببوونەوە، ئاخر ئەوە چۆن ئەکرێ بە دیاریی، ناچار بۆ ئەوەی لەسەر جادەی گشتیش فڕێ نەدرێت و بە هۆیەوە ڕووداوی سەیارە ڕووبدات، دام بە حەماڵەکەو دیارە ئەویش بە حسابی خۆی ئەیدا بە یارو دڵداری خۆی نەیفەوتاندوە.. دووەم کارتۆنێک گوڵی نایاب بوو، کە بینیمەوە دڵخۆش بووم کە دیارییەکی باشەو دام بە کچەکان، سێیەمیشیان کە زانیم جلوبەرگی ژێرەوەی ژنانە، زۆر پێم شەرم بوو من دیاریی ئاوایان بدەمێ و لێم وەرگرتنەوە.. ئیتر بۆ ئەبێ شتی تیابووبێت، بڵێم چی حەماڵە ساختەچییەکە ئەویشی فڕی نەداوەو بۆ خۆی و یارەکەی هەڵگرتووە.

کرمانج: کورە تلیاکەکەم بەم دوو چاوەی خۆم بینی ڕێشار درۆی چی ئەکەی؟.. تا ئێستاش پشکنین بەردەوامە، تۆ مسۆگەر نیت کە نادۆزرێتەوە، ئیتر نکوڵیی لە چی ئەکەی؟

ڕێشار: بەڵێ کە تاوانبار نەبم، چۆن نکوڵیی ناکەم و دان بە شتێکا بنێم نەمکردبێ؟ ئەتوانی بەڵگەیەکم بدەیتێ؟

ڕاهۆز: من دۆسیەکەت ئەخەمە بەردەمی دادوەرو دڵنیابە بەم درۆو فرت و فێڵە ڕزگارت نابێ، باشتر وایە دان بە تاوانەکانتا بنێی.. ڕەنگە دواتر بە کۆکردنەوەی بەڵگەکان حاشا کردن دادت نەدا.

ڕێشار: ببورە گەورەم، تەنها بەڵگە تاوانم بەسەردا ئەسەپێنێ.

ڕاهۆز: کێشەمان نییە.. بڕیار لای دادوەرە.. ئێمەش هەموو ئەو بەڵگانەی کە تۆ نەتبینیون، ئەیخەینە بەردەستی.

(( دۆسیەکە هەڵئەگرێت و ئەچێتە دەرەوە))

کرمانج: ڕاستگۆبە ڕێشار هاوکاریت ئەکەم.

ڕێشار: زۆر ببورە گەورەم من پیاوێکی بازرگانم و هیچیتر، کەس ناتوانێ بەزۆر بمخاتە ئەو چاڵەوەی کە بۆی هەڵکەندووم.

کرمانج: من دڵنیام دواجارت ئەبێ نکوڵیی بکەیت.. شتی زۆرمان لایە.

(( حواریتر لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٣٧٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٣٧٠ – کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو نارەوەن))

زوبێر (( سەرسوڕمان)): خدر؟؟؟؟؟؟

نارەوەن: نەموت پێت سەیر ئەبێ؟

زوبێر: نا زۆر سەیر نییە بۆ ئەو، بەڵام لە ئاستیی باشیی تۆیا سەرم سوڕ ئەمێنێ.. ئەوە قوربانییە تۆ ئەیدەی بۆ ئەو کابرایە ئەزانی؟ .. بڕوانامەشی هەیە؟

نارەوەن: بەڵێ، بەڵام قوربانیدان نییە تەنها هاوکارییەو هیچیتر.

زوبێر: دەی منیش ئامادەی ئەو هاوکارییەتم.. تۆ داوای چارەکێکت کرد بۆ ئەو.. من لە زۆرینەی بەشەکەم خۆش ئەبم، بۆ هەر یەکێکمان یەک لەسەر سێ.. بەڵام مەرجم هەیە.

نارەوەن (( زۆر دڵخۆش)): تۆ ئەمر ئەکەی کاکە زوبێر گیان، مەرجت سەر سەرو سەر چاوم. زۆر سوپاس بۆو دڵفراوانییەت.

زوبێر: یەکەم، هەردووکتان هەر ئەمڕۆ پارەی تەواوم بۆ ئەهێنن.. دووەم من پەیوەندیم بە هیچ شتێکەوە نابێت قازانج نەبێت.. سێیەم مەرجیشم ئەوەیە ژمێریارێکم مانگانە وردبینیی لیستی ژمێریاریتان بکات.. هەر ئەمڕۆش تا شەویش بێ، گرێبەستەکەمان ئەنووسین.

نارەوەن: هەمووی بەجێیەو سەرچاوم.. ئەوا ناومانا کۆمپانیای ڕێژوان.

زوبێر: نەخێر کۆمپانیای نارەوەن، قسەشی تیا ناکەی.

نارەوەن، بەڵێ باشە.. بەڵام تکاکەم ئەوەیە دارەوان نەزانێت من زۆرم کردووە بۆ بەشداریکردنی حەمەخدر.

زوبێر: سەرچاو.

(( پێکەنین و دیالۆگ لە میوتیدا)) ________ Cut ________

دیمەنی – ٣٧٤ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( ڕێژوان و هەندرێن و تافان و سەلواو باڵاو کڵپە))

هەندرێن: ڕێک قسەکەی تۆیە، کەس متمانەی نەماوە.. ئەیبینی چ تاوانبارێک دیارەو دواتر ئەفسەری نهێنیی دەرئەچێت و کابراش بازرگانیی تلیاک ئەکات و ڕەنگە وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچێ.

ڕێژوان: گرنگ ئەوەیە ئێوە توشی کێشە نەبن و زوو ڕزگارتان ببێ.

تافان: نا وتی ئێمە تەنها بۆ شایەتیی بانگ ئەکرێین، خۆیان ئەیانزانی گەر شتێکمان هەست پێ بکردایە زوو ئەمانگەیاندە پۆلیس.. کاک کرمانجیش ئاگاداری هەموو شتێک بوو، جا باش نەبوو ئەو هەبوو؟

ڕێژوان: دەی لەخوا بەزیاد بێ، دەرکردنەکەتان خێری پێوە بوو.. لەم کاتەیا کارمەند بوونایە، توشی گێرەو کێشەی زۆر ئەهاتن.

هەندرێن: بەڵێ بەڵێ هەر زۆریش.

سەلوا: جا خۆ هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر ڕێشاریش نییە، وەک بیستم.

ڕێژوان: نەوەڵا، ئەگەر ئێستە ئەویش ئازاد نەکرابێ سبەی هەر بەر ئەبێ.

تافان: کورە ئەو ئیشەکەی بە ئێمە کردووە، بێ ئەوەی ئاگاداری هیچ شتێک بین.

هەندرێن: هەر ئەسڵەن دامەزراندنی ئێوەی بۆ ئەو دوو سێ کارتۆنە بوو، خوا ئەزانێ بە چەند کەسیتریشی کردووە.

سەلوا: بەخوا هەر بە باسکردنیا دیارە چەند هیچ و پووچە.

باڵا: وەڵا منیش ڕقم لێیەتی، دایمە دایکم و باوکمی ئەبرد بۆ ئیش ئێوارە ئەهاتنەوە.

کڵپە: ئێوارەی چی؟ وەڵا شەو.

هەندرێن (( بۆ ڕێژوان)): دەی ئێوەش بەیانی ناوی خوای لێ بێنن، خۆ ئامادەن؟ Cut

دیمەنی – ٣٧٥ – ش/ن - ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن مۆبایل دائەخاتەوە))

تیرۆژ: ئەڵێ چی؟

نارەوەن: شەو نایەتەوە دەعوەتی حمەی فلتەرانییە برادەرانی لەگەڵایە.

تیرۆژ: هەلەو باوکە قەپاتەکەم.. ئێمەی داماویش هەر لە کونجی ژوورەوە.

نارەوەن: دەی تۆش بۆ داوای شەو چوونە دەرەوە ناکەی؟

تیرۆژ: ئۆهۆووو خۆ ناوێرم سوعبەتێکیش بکەم.

نارەوەن: ئەوە خورتەو بۆڵەیە کچم، کوا سوعبەت ئاوایە؟ هههە بۆ تێت ناگەم؟

تیرۆژ: چی تێ ئەگەیت و تێ ناگەی؟ من لەسەر نیەتی خۆم وتم.

نارەوەن: بەم زستانە داوای باخەکە ئەکەی.. ئەوە تێ ئەگەم.. (( زەنگی مۆبایل)) گیان ئەلو (( تیرۆژ تورەو ئەچێتە ژوورێکیترو نارەوەن چاو ئەگێرێ تیرۆژ رۆیشتووە، بە سووکیی قسە ئەکا)) ها ماڵەکەم تۆ باشیت؟............... خێرا وەرە ئەچین بۆ ماڵی کاک زوبێر بۆ نوسینی گرێبەستەکە........... بەڵێ پارێزەری خۆی ئەهێنێ................. دەی جارێ خواحافیز.

(( نارەوەن دائەنیشێت و رامان و جاروبار خەندە))

Cut

دیمەنی – ٣٧٦ – ش/ن – شوێنی پاشا:

(( پاشا وەک حاڵەتی ئاسایی خۆی، قناعی لەسەردایەو دەستکێش لە دەستیا ))

مالە: ویستم بچم بۆ دێیەکەی خۆمان پاشا گیان، ماڵە خزمان ئەمپارێزن، پێم باش بوو جارێ لەناو شارا نەمێنم..

پاشا: دڵنیابە هەڵەیە. حەتمەن ئێستا کرمانج ناوی تۆشی بردووەو بەدواتا ئەگەڕێن، بە خۆگورگە کردنت شتمان بەسەرا ساغ ئەبێتەوە.. بچۆرەوە ناوشارو لە چایخانەکەش دەرکەوە، با بگیرێیت، چەند ڕۆژێکەو ڕزگارمان ئەبێ لەو دڵەڕاوکێیە.

مالە: بەسەرچاو گەورەم.. ناچمەوە دێیەکەی خۆمان

پاشا: ماڵی حەماڵەکەت بۆ سوتاند؟ من بە ڕێشارم وتبوو تەنها ئەو کارتۆنانە بسوتێنن.

مالە: پاشا گیان ماڵەکەی زۆر درابوو بەسەریەکا.. هەندێک بۆ کارتۆنەکان گەڕام نەمدۆزیەوە، وام بە باش زانی هەموو ماڵەکە بسوتێنم تا دوو کارتۆنەکەشی پێوە بسوتێ.

پاشا (( تەقینەوەو هەڵئەسێتە سەرپێ )): کەواتە تۆ دوو کارتۆنەکەت نەبینی؟

مالە: نەخێر پاشا گیان، بەڵام دڵنیابە لەگەڵ ماڵەکەیا سوتاوە.

پاشا: بەچی دڵنیابم؟ کێ ناڵێ پێش ئێوە پۆلیس چاودێریی ئەو ماڵەی نەکردووەو دواتر گومانیان لەو دوو کارتۆنە نەکردووەو نەیانبردووە؟ وەک ئەڵێی ماڵەکەشی دراوە بەسەریەکا، هەڵبەت کەسیک بۆی گەڕاوە.

مالە: نا پاشا گیان، بەوجۆرە نەدرابوو بەسەریەکا کە کەسێک بۆ شتێک گەڕابێ.. مەبەستم ئەوەیە ژووری نوستنەکەی شێواو بوو.. پاشا گیان من ویستم ......... (( لەکاتی قسەکانی مالەدا، پاشا دەمانچەیەکی کاتم دەرئەهێنێ و فیشەکێک ئەتەقێنێ بە ئاراستەی مالەو بەر شوێنێکی ئەکەوێ، دوو کەس دێن و تەرمی مالە هەڵئەگرن و ئەیبەنە دەرەوە )) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٣٧٧ – ڕ/ن – چێشتخانەیەک:

(( خدر بە قاتەوە شیک و نارەوەن، لە چێشتخانەیەکن ماسییان لەبەردەستدایەو بە هێواشیی بەدەم قسەوە ئەیخۆن))

خدر: بەربوونی چی؟ هەر کە کارتۆنەکانم برد بۆ نەقیب ڕاهۆز، یەکسەر ناردی بۆ پزیشکی دادوەریی و دەرئەکەوێ تلیاکی تیابووە، ئەوەش نەبێ هەر سەگە ڕاهێنراوەکانی تێبەردەن بۆنی ئەکەن.

نارەوەن: ئەزانی ئاقڵیی تۆ بوو وتت بیبە؟ ئەگینا لەماڵەکەدا سووتابوو.

خدر: پێم زیادە بوو لە ماڵەکەیا.. من ئێستا گومانێکیشم هەیە دارەوانیش تووش بێ، ئەمشەو پۆلیس نەهاتن بۆ پشکنین؟

نارەوەن: چک نەهاتن، بەڵام ئەگەر دەربکەوێ ئەویش دەستی هەبووە لەگەڵیانا چی ڕوو ئەدا؟

خدر: بازرگانیی کردن بە تلیاکەوە سزاکەی گەورەیە، بەلانی کەمەوە هەر هیچ نەبێ پانزەساڵ زیندانییەو دەست بەسەر هەموو ماڵ و موڵکیشیدا ئەگیرێ.

نارەوەن: بەوەی باشە خانووەکەو بەشەکەی لەگەڵ زوبێر لە کۆمپانیاکەو وەکالەتەکەش هەر بە ناوی خۆمەوەیە.. جا کێ ئەڵێ ئەویش دەستی تیایە؟

خدر: ساویلکە مەبە، بە خۆڕایی ئاو لە ڕێشارەوە ناچێ بۆ قاوەخانەکە لەسەر ئەمری دارەوان.

نارەوەن: تۆ بڵێی دارەوان ئەوەندە زۆرزان بووبێت، ئەو شتە ترسناکەی کردبێت و لە منی شاردبێتەوە؟

خدر: کە بەڕەواڵەت ئەیبینی زۆر بێدەنگ و داماوە.. بڵێم چی؟ خۆ کەس لەم خەڵکە تێناگا.

نارەوەن: وەک تۆ هههه کەس لەو بڕوایەدایە تۆ حەماڵ نەبیت؟ هههه نەبەخوا، ئێستا کەسێک ئاوا بتبینێ هەر ناتناسێتەوە.

خدر: گرنگ ئەوەیە تۆ ئەمناسیتەوە.. بەس پێت بڵێم، هەتا ئەم گروپە تەواو نەبێتەوەو نەگیرێن، باوەڕ مەکە بهێڵن دەست لە حەماڵییەکە هەڵگرم.. ئەوسا وەکالەتەکە چی لێ بکەین؟

نارەوەن: ئافەرین.. دەی تازە بە زوبێریشم وتووە کە تۆ لەگەڵمای.

خدر: کێشەی زوبێرم نییە، ئەویش ئەگیرێ.

نارەوەن: ئەویش لەگەڵیانایە.

خدر: نازانم.. بەڵام بەپێی بەڵگەکان وا ئەزانم ئیشی حماڵییەکەم نزیک بووبێتەوە لە کۆتایی.. ئەی ئەگەر دارەوان گیرا تۆ چی ئەکەی؟

نارەوەن: هیچ.. پانزە ساڵیشە دارەوان دوورە لە منەوەو بۆ خۆی ئەژی، حەوت و نیوی بەیانی ئەڕوا، یانزەو دوانزەی شەو بۆ من دێتەوە.. ئەگەر بگیرێ، تەنها ئەوەم لەدەست ئەچێ، کە بۆ خەوەکە نایەتەوەو ئیزعاجمان ناکا. هههه چش با هەر نەیەتەوە.

خدر: نا نا هەر پیاوی ماڵەکە بووە، ئینجا کێ ئەڵێ ئەگیرێ؟ ڕەنگە ئاو کرێنەکەش ئاسایی بێت.

نارەوەن: ئەی پاسەوانیی کردنی خۆم و مناڵەکان لەلایەن ڕێشارەوە؟

خدر: تا ئێستاش لوغزی ئەم کێشەیە ئەوەیە لای من.

نارەوەن: تۆ لە ناڵیش ئەدەیت و لە بزماریش، خەریکە لە تۆش تێنەگەم هههە.

(( بەدەم ماسیی خواردنەوە، دایالۆگ لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ٣٧٨ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

((سەرکۆو کرمانج/کۆژین))

کۆژین: بەڵێ گەورەم دانی بە هەموو شتێکدانا.

سەرکۆ: زۆر باشە، ئەی دۆسیەکەی زوبێر؟

کۆژین: گەورەم ئەمڕۆ کارڕایی بۆ ئەکەین و هەواڵەی پۆلیسی ئەکەین، دەسەڵاتی ئەوانە.

سەرکۆ: بەهیچ جۆرێک ناوی خدر مەبەن لە پلانەکەدا، با دەرنەکەوێ.

کۆژین: ڕەنگە پێویست نەکات، هەر ئەنوسین بە پلانێکی خۆمان ڕێمان لەو تاوانە گرت، بەڵام لە کاتێکدا زوبێر نکوڵیی بکا، ئەوسا پلانەکە داوائەکرێ.

سەرکۆ: نا باوەڕ مەکە، هەموو شتێک ئاشکرایە، لە نکوڵیی کردنا نەماوە.

کۆژین: زۆر ڕاستە.

سەرکۆ: ڕاپۆرتێکم لەسەر چالاکییەکەتان ئامادە کردووەو ڕۆڵی تۆو خدرو ڕاهۆزم بەرز نرخاندووە، داوای سوپاسنامەی تایبەتم بۆ کردوون.. ڕەنگە پلەشتان بۆ بێتەوە.. بەو هیوایە.

کۆژین: زۆر سوپاسی جەنابت ئەکەم گەورەم، بەڵام بەڕاستی بۆ هیچ شتێکمان نەکردووە، بۆ بنبڕ کردنی ئەو ژەهرەو پاراستنی گەنجەکانمان نەبێ.

سەرکۆ: بەڵام بە وریایی خۆتان مانەوە، ئەگینا زۆرکات مەترسیی لەسەر ژیانیشتان دروست ببوو.

Cut

دیمەنی – ٣٧٩ – ڕ/ن – ژووری دادوەری لێکۆڵینەوە:

(( دادوەرو ڕێشار))

کرمانج: دوای ئەوەی تلیاکەکەش دەستی بەسەردا گیراو خۆشت لە پشکنینی تەندروستیی دەرنەچوویت و کارتۆنەکانیشت بینیەوە پێش سوتاندنی ماڵەکە چۆن چووین و هێنامان، دوای دوو کرێکارەکەی قاوەخانەکەو خورشید، کە بەناوی پیتزاوە تلیاکی بۆ ئەپێچرایەوە، ڕفاندنی خەڵک و ئازاردان و ئەشکەنجەدان و سوکایەتیی کردن بە زۆرکەس و کوشتنی خزمەتکارەکەت.. دوای ئەوەی گوێت لە هەموو تۆمارە دەنگییەکانی خۆت بوو، کە سەرەتا نەتئەزانی هیچ شتێک فەرامۆش نەکراوە.. ئێستاش حاشای لێئەکەی؟ ئێستا ماوەتەوە ئەوەی پێمان بڵێی پاشاکەت کێیە؟ ئەگینا تۆ بە تەنها هەموو تاوانەکانت بەسەرا ساغ ئەبێتەوە.

ڕێشار: نازانم پاشا کێیە.. هەموو جارێ کە ئەمبینی تورەکەیەکی ڕەشی ئەدا بەسەریاو پاسەوانەکانیشی هەروابوون.. تا ئێستاش نازانم کێیە.

دادوەر: شوێنی دانیشتنی ئەزانی؟ لە کوێ ئەتبینی؟

ڕێشار: لە ڤێلایەکدا بوو لە باخێکی دەرەوەی شار، لێرەوە بەچاو بەستراویی ئەیانبردم بۆ لای.. بەڵام جارێکیان ڕۆژ بوو پێش ئەوەی چاوم ببەستنەوە لە گەڕانەوەدا، دەوروبەرەکەم بینی.. ئەتوانم بیناسمەوە.. پێش سەیتەرەی یەکەمیش چاویان کردمەوەو ئیتر دڵنیا بووم بە هەڵەدا نەچووم لە دەستنیشان کردنی ناوچەکە.

دادوەر: لەگەڵ ئاسایشدا ئەچیت بۆ دۆزینەوەی ڤێللاکە.

ڕێشار: بەسەرچاو.

(( دادوەر هەندێ شت ئەنوسێت و زەنگ لێ ئەدات و زەنگ لێ ئەدات و پۆلیس دێتە ژوورەوە، ئاماژەی پۆلیس ئەکا بیباتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٣٨٠ – ڕ / ن – بەردەمی ماڵی دارەوان:

Mute

(( ئاسایش لە بەردەم ماڵی گێلاسی کۆنن و هەندێکیان لە ژوورەوە دێنە دەرەوەو دوو ژن و پیاوێک ئەگیرێن و سواری سەیارەی ئاسایشیان ئەکەن و دوا پۆلیس بە زنجیرو قفڵ دەرگاکە دائەخات))

Cut

دیمەنی – ٣٨١ – ڕ/ د – سەر ڕێگای ڤێللای دارەوان):

(( سەیارەیەکی بەرزی ڕەش، لە ڤێللاکەوە دێتە دەرەوە، کە ئاسایشەکان ئەبینێ، ئەوەستێت و دووکەس بە دەمامکەوە دائەبەزن بە مەبەستی تەقە کردن.. ئاسایشەکان زووتر دێنە دەست و ئەیانکوژن.. یان دەرهێنەر خۆی شەڕەکە جۆر بکا.. دواتر سەیارەی ئاسایشەکان یان بە پێ، بگەنە سەر سەیارە ڕەشەکە، دارەوان لە پشتەوە بە ماسکە ڕەشەکەوە دانیشتووەو دەست بەرز ئەکاتەوە.))

(( کرمانج دەمامکەکەی لائەبا )):

# (( ئەڵقەی نۆزدە ))

کرمانج: ئەوە تۆ پاشاکە دەرچووی نادارەوان؟ بەڕاستی لێزان بووی.

(( دواتر گەر بچن ناو ڤێللاکەش بپشکنن دوای ئەوەی کلیل لە دارەوان وەرئەگرن.. گەر بلوێت بچنە سەر قاسەیەکی گەورەو پارەیەکی زۆری تیابێت و مصادرة بکرێت باشترە ))

Cut

دیمەنی – ٣٨٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( زوبێرو نارەوەن و خدر بە قەمسەڵەیەک و پانتۆڵەوە دێنە ژوورەوە، لە پێشەوە زوبێر))

زوبێر(( ماندوو دڵخۆش)): تەواو ئیتر؟ ئیشی منی تیا نەما؟

نارەوەن: ماندووم کردی ببورە.. بەڵێ تەواو.. ئیتر ئەوە ماوە شوێنێکی بۆ دیاری بکەین.

زوبێر: ئەوە بۆ تۆو حمەخدر.. ئیتر من پەیوەندیم بەسەر هیچ شتێکەوە نییە، ئەمڕۆ منتان کرد بە فرفرۆکە.. کچێ کوا من لەو تەمەنەیا ماوم ئەو هەموو بێنەو بەردەیەم پێ بکرێ؟

خدر: لەشت ساغ بێ کاک زوبێر گیان، بەڵام نا نا جارێ هەر بەگوڕیت.

نارەوەن: لە من هەر زۆر باشتری بێ چاوێنیی بیت.

زوبێر: تۆ؟ تۆ ئەتوت تەیارەی بە کەس نەئەگیرایتەوە هههه بۆ حمەخدر پێت ڕائەگەیشت؟ هههه (( پێکەنینی هەرسێکیان))

خدر: من لە دڵەوە سوپاستان ئەکەم، بەڕاستی لە خەویشا ئەمەم ببیستایە باوەڕم نەئەکرد، کە ڕۆژێک لەڕۆژان منیش بچمە ڕیزی خاوەن کارە گەورەکانەوەو دەستمایەم هەبێ.

زوبێر: هەموو هەر وا پێگەییوین حمەخدر گیان، تۆش قەت هیچت کەمتر نەبووە لە سەرمایەدارەکان، بەپێچەوانەوە تۆ زیاتر لە ئێمە ڕەنجتداوەو ماندووش بوویت.. ئومێدم زۆرە ڕۆژێک دێت تۆ لە سەرمایەدارە گەورەکان بیت، بەو دڵ و دەروونە جوانەتەوە.. تۆ ڕەنج ئەدەیت و تێکۆشانت بەردەوامە، بۆیە ئەو ڕۆژە هیچ دوور نییە.

خدر: سوپاسی لوتف و گەورەیی و بیروهۆشی جوانی تۆ ئەکەم، ئێمە پەروەردەی دەستی ئێوە بین، بەردەوام بچووکیتان ئەکەین.

نارەوەن: تۆ شایانی هەموو شتێکی باشیت حمەخدر گیان، ئەوەش ڕای گەورەکان لەسەرت، باشە؟ ئەرێ کاک زوبێر ئەڵێی دارەوان ئەمشەو زۆری خواردۆتەوە، وا تا ئێستاش دیار نییە، تۆ بڵێی هەر نەهاتبێت؟

زوبێر: ئێستا بانگی ڕێژوان ئەکەم بزانین نەهاتووە؟ ژوورەکەی داخرابوو، ڕەنگە هاتبێ و چووبێتەوە دەرەوە، زۆر درەنگە.. (( زەنگ لێ ئەدا ))

Cut

دیمەنی – ٣٨٣ – ڕ/ د – دوکانی ئامۆ:

(( ئامۆو هەڵشۆو ئاوا ))

ئامۆ: ئەوە تۆ ئەڵێی چی هەڵشۆ قەت قسەی خێر بەدەمتا نایەت، باوکم چی کردووە تا بگیرێ؟

ئاوا(( یەخەی ئەگرێ)): بەزاتی خوا درۆ بکەیت ڕێک ئەتخنکێنم.

هەڵشۆ: بەخوا درۆ ناکەم، لە باخێکا گیراوە لە دەرەوەی شار.(( ئاوا بەرۆکی بەرئەدا ))

ئامۆ: باخەکەی خۆمان؟

هەڵشۆ: نا باخێکیترە.

ئاوا: هەتیو قسەکانت هیچی بەسەر هیچەوە نییە، ئەبێ ئێستا باوکم لە کۆمپانیا بێ، چی ئەکا لە باخی خەڵکا؟ بۆیە ئەزانم درۆ ئەکەی.

هەڵشۆ: بەخوا هەر هاتم هەواڵەکەتان پێ بڵێم بەڵکو بتوانین پارێزەرێکی بۆ بگرین یان شتێک بکەین، ئەوە شتێکە درۆی تیا بکرێ؟

(( ئاوا تەلەفون ئەکا ))

ئامۆ: دایکم زانیویەتی؟

هەڵشۆ: نا بەو و بە تریفەم نەوتووە.

ئاوا(( بە مۆبایل)): ئەلو مەرحەبا........... ئەوە باوکم لە کوێیە خۆی بۆ هەڵی نەگرت؟..................... ئیشی چی هەیە برا، ئێمە بەدوای ئەوا ئەگەڕێین، ئا ئەو مۆبایلەی بدەرێ........... ئەرێ ئەوە چییە ئەو هەموو پرسیارە؟ ئەبێ ئیشی چیم پێی بێ؟ باوکمە باوکم..................... بێم بۆ کوێێێێێێێێێێێێێێێ؟؟؟؟؟ (( زۆر ئەشڵەژی و مۆبایل دائەخاتەوە ))

ئامۆ: ئەڵێ چی؟ بۆ وا تێکچووی؟ ——————— Cut ———————

دیمەنی – ٣٨٤ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( عقید بەهێز، تەمەن نزیکەی ٤٥ ساڵ، سمێڵ ڕەشێکی شیک، لەگەڵ مولازم ئاری تەمەن نزیکەی ٣٥ ساڵێک دانیشتوون و مفەوەزێک ئیفادە ئەنوسێتەوە ))

بەهێز: دانی پیا ئەنێی کە هەوڵتداوە بۆ کوشتنی تریفەی کچی دارەوان.

زوبێر: بەڵێ.

بەهێز: هۆکەی چی بوو؟

زوبێر: قوربان چیمەنی کچم دڵی لاوازەو بەرگەی شۆک ناگرێ.. ئەو پەیوەندیی لەگەڵ ئەم هاوسەرەی ئێستای هەبوو.. هاوسەرەکەی فرێنرا، من گومانێکم لادروست بوو کە دارەوان ئەو کارەی کردبێ بۆ هەلقۆستنەوە لە من، بەڵگەکان لە گومانەکەی مندا کەڵەکە نەبوون.. هەرچەندە خۆم بەردەوام لەگەڵ لێبوردەییدام، بەڵام چیمەنم زۆر خۆش ئەوێ، نەمتوانی لە ئاستی ئەو ئازارەی ئەودا دەستەوسان بم، لەبەرئەوە ویستم تۆڵەی بکەمەوە.

بەهێز: کەواتە دڵنیا نەبووی لەوەی کە دارەوان ئەو کارەی کردبێ؟

زوبێر: نەخێر دڵنیا نەبووم، ئەوە بوو دواتر دەرکەوت ڕێشار زاواکەمی فڕاندبوو، نەک دارەوان، (( شپرزەیی دەروونیی)) قوربان لە شەرمەزارییا نەمئەزانی چی بکەم؟ سەیارەیەکی باشم بۆ کڕی، بەڵام ئەو برینەی کەوتە دەروونمەوە تا ئێستاش ساڕێژ نەبووە.

بەهێز: گومانەکەت لە جێی خۆیدا بووە، دارەوان فەرمانی بە ڕێشار کردبوو ئەو کوڕە بفڕێنێ.

زوبێر: چۆنننننننننن؟؟؟؟؟!!!!

بەهێز: ڕۆستەم و سالم بکەرە ڕاستەقینەکانن بۆ هەوڵی کوشتنی تریفە، جێ و ڕێی ئەوان؟

Cut

دیمەنی – ٣٨٥ – ڕ/ن – ناو سەیارەی زوبێر:

(( ڕێژوان و بروسک، بێتاقەت، بروسک سەیارەکەی زوبێر لێ ئەخوڕێ))

ڕێژوان: دەی چی بکەین؟ چۆن لە ڕوومان بێت تەماشای کاک دارەوان و نارەوەن خان بکەین؟ تازە ناشتوانین بەشەکەمان بفرۆشین، ئەو گیرابێت.

بروسک: من تەنها خەمی چیمەنمە توشی شۆک نەبێت، بۆ دڵی زۆر خراپە.

ڕێژوان: ئەویش نەگبەتیەکیتر.. رەنگە منیش سەلوام لێ بسەنننەوە بڵێن کچ نادەین بە ئێوە پیاوکوژن.

بروسک: خەمی ئەوەت نەبێت، چارەسەری ئەکەم. جارێ ئەبێ وا بە چیمەن بوترێ، توشی شۆک نەبێت و شتێکی بەسەر نەیەت.. ئەوانیتریش چارەسەر ئەکەین.. هەستە جارێ بابچینەوە بۆ ماڵەوە، ئیتر کەڵکی کۆمپانیامان پێوە نەماوە، بەردەوام کاک دارەوان لەوێیە.

ڕێژوان: ئاخ باوکە، ئاخ! ئاخر ئەمەت بۆ کرد؟ من چوزانم ئەو دوو سەرسەرییەت بۆ ئەمە بە کرێ گرتبوو؟

(( هەردووکیان بە پەلە هەڵئەسن و ئەچنە دەرەوە))

دیمەنی – ٣٨٥ – ش/ن – ماڵی دارەوان:

(( نارەوەن و تریفەو ئاواو ئامۆو تیرۆژو خدر.. هەموو بێتاقەتن، تیرۆژ ئەگری))

ئامۆ: دڵنیابن شتێک ڕوویدا، من جارێکیتر ناتوانم بچمەوە ناو بازاڕو ئیش بکەمەوە.

تریفە: ئەی دوکانەکەت؟

ئامۆ: گوو بە دوکان.. بە چ ڕوویەکەوە بیکەمەوە؟

نارەوەن: لەخوا بەزیاد بێ تا ئیستا کەسێک نییە پەنجەیەکی خراپتان بۆ درێژکا، ئیتر ڕووی بۆچییە؟

ئاوا(( عصبي)): با یەک شتت پێ بڵێم دایە گیان.. بەسەری تۆ هەر بڕیارێکی خراپی لەسەر بدرێ، کە دڵنیام ئەدرێ.. ئەم وڵاتە جێ ئەهێڵم و سەری خۆم هەڵئەگرم چاک بزانە.

ئامۆ: منیش هەمان بڕیارم هەیە.

خدر: پەلە مەکەن ئەو بڕیارە زۆر قورسە، ئێوە دایکتان تیرۆژ بۆ کێ جێ ئەهێڵن؟

هەڵشۆ: ئەی من چیم لێرە کابرا؟ تۆ بۆ نازانی قسە بکەی؟ ئاخر بۆیە خەڵک وا سەیری حەماڵ ئەکا ئەوە ئەقڵ و دەمکردنەوەیانە. ئەمە هێشتا نەبووە بە هیچ وا قسە ئەکا، جا وەرە وەکالەتەکە بکرێتەوە؟!

نارەوەن(( توڕە)): دەمت داخە بێغیرەت، وەڵا بەتەمای تۆ جێمان بهێڵن پێش ئەوەی گورگ بمانخوا خۆت لەتوپەتمان ئەکەی.

ئاوا: من بەسەر ئەوا بەجێتان ناهێڵم ئەزانم چ بێغیرەتێکە.. دایکە ئێمە تیرۆژیش بە خۆت ئەسپێرین، تۆ لەسەد پیاوی (( ئامازەی هەڵشۆ ئەکا)) وا پیاوتری.

خدر(( هەڵئەسێ)): بە یارمەتیی ئێوە، هەندێ ئیش و کارم هەیە، ئەبێ بچم بەلایانەوە.

ئامۆ: تکایە کاک حمەخدر لە قسەکەی هەڵشۆ زویر نەبووبیت، ئەو هەر وایە نازانێ قسە بکا.

خدر: نە بابە چۆن عاجز ئەبم؟ جا هەریەکێ تۆی بەدڵ نەبێ و لەگەڵیا بیکێڵی، چۆن دەریئەهێنێ؟ نا نا باوەڕ بکە هەر ناشزانم چی وت!

(( ڕۆشتن و بەڕێکردنی خدرو دانیشتنەوە))

نارەوەن(( زۆر توڕە)): تۆ چ داخێکی ئەو کوڕەت لەدڵایە ناکەس بەچە؟ ئەوە قسە بوو تۆ کرد؟

هەڵشۆ: ئەی ئەو هەر حسابی بەشەریشی بۆ نەکردم، منیش ئاوا ئەیتەزێنم.

ئاوا: دیارە تۆ دەرماڵت نییە هەڵشۆ.. ئەو کوڕە بە پیاوەتی خۆی هاتووە بۆ بەشداری کردنی خەمی ئێمەو دۆزینەوەی چارەسەرێک، نەک وەک تۆ بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکی وادا بە بەشەرت بزانین.

هەڵشۆ: ئێوە هەرچییەکم پێ بڵێن و تێشمهەڵدەن، برای گەورەن، بەڵام ئەو حەماڵە بۆی نییە بچوکترین قسەش لە ئاستی منا بکا.

نارەوەن: دەی بەسەری خۆت ئەوەی تۆ پێی ئەڵێی حەماڵ، ئەبێ وای لێ بکەم لە پیاوەتیدا ناوبانگی بڕوا.. تۆش هەر خەریکی شەوگەڕیی خۆت بە.

Cut

دیمەنی – ٣٨٦ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هەندرێن و هاوڕێ و ئەردەڵان))

هەندرێن: بۆ من زۆر ئەخاێنێ هاوڕێ گیان، ئەی تۆ بۆچی هەموو نیوەڕوانێک یەک دوو لەفەم بۆ ناپێچیتەوەو بۆم بێنی؟ تا لە وەکالەتەکەوە ئەگەمە ئێرە ئەزانی چەندی پێ ئەچێ؟

هاوڕێ: نەک هەر جارێک هەزارجار، ئەگەر ڕۆژیی دە جاریش هەر نوکەیەکم بۆ بکەی چات بۆ ئەهێنم.. ناشوکری نەبێ خۆ کەسی لێ نەماوە.. کاک حمەخدرو نارەوەن خان و ئەم ورگنە.

ئەردەڵان: ئەگەر منت نەئەبووم؟!!!!!!!!!!! ئەبووایە بۆ کریکە قەرز بکەی.

هاوڕێ: ئەونە دەستەسان نیم با بزانی، هەر دەری نەهێنا منیش حەماڵی ئەکەم، ئیش هەر ئیشە.

ئەردەڵان: ئۆوهۆوووو جا خۆ من حمەخدرم لێ نابڕێ؟!!!

هاوڕێ: ئەم ماوەیە زۆر بێتاقەت دیارن کاک هەندرێن، هیچ هەیە؟

هەندرێن: نارەوەن خان ئەڵێی؟

هاوڕێ: ئەی نازانم ئەویش و کوڕەکانیشی هیچ دیار نیین، نە لێرەو نە لە دوکانەکەشیان.

هەندرێن: بۆ نەتزانیوە؟

هاوڕێ: نەوەڵا، چیم زانیبێ؟

هەندرێن: ئەی هەر کە فەرمانی لەسێدارەدانەکەی کاک دارەوان دەرچوو حەفتەی پێشوو، کوڕەکان وتیان چاومان بەرایی نادا مردنی باوکمان ببینین، چوون بۆ دەرەوەی وڵات، وابزانم یەکجارەکیشە.. ئەوە نارەوەن خان بێتاقەتی ئەوەیە.

هاوڕێ: لاحول ولا قوة الا باللە.. وەڵا بەداخەوە.. جا ناڵێن بۆ کوێ چوون؟

هەندرێن: نازانم، هەر ئەوەندە ئەزانم و هیچیتر.

هاوڕێ: دەی قوڕبەسەریی و نەگبەتییەکەیان بۆ نارەوەن خانی داماو جێهێشتووە.

ئەردەڵان: کورە کوڕ ئەوەندە کوڕە تا بە سێبەری خۆیا هەڵەڵڕوانێ، دوای ئەوە بەدایک و باوک چی؟

هەندرێن: ئیتر مەسەلێکیش هەیە، ئەڵێ بەڵا بە تەنها نایەت.

هاوڕێ: خوا ڕەحمیان پێبکا ئیشەڵڵا.

Cut

دیمەنی – ٣٨٧ - ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر:

(( خدرو نارەوەن دانیشتوون))

نارەوەن: با.. کوڕەکەیان تەلەفونێکی کرد، وتی لە ڕووم هەڵنایە بتانبینم، ئێمە لەسەر قسەی باوکم هەموو پشکەکانی لە کۆمپانیاکەو وەکالەتەکەدا بە تۆ ئەفرۆشین، بە نرخێکی زۆر کەم.

خدر: هەر ئەبێ وا بکەن، باوەڕ ناکەم هیچ چارەسەرێکیتریان هەبێ، ئەو پیاوە دانایەو زۆر تێگەیشتووە.

نارەوەن: توخوا قسەم پێ مەکە! تێگەیشتوو بووایە ئەوەی نەئەکرد.

خدر: ئەوە کاردانەوە بوو، گرنگ ئەوەیە هیچ ڕووینەدا، تکا ئەکەم لەبیری خۆتی ببەیتەوە، تازە کۆن بووەو ئەویش سزای خۆی وەرگرت.

نارەوەن: بەڵام تۆ پێت نەئەوتم ئەو هەوڵیدابوو بۆ کوشتنی تریفە، ئەگەر ئەوسا بمزانیایە، ئێستا زۆر کۆن ببوو.. هەمووی مانگێک نابا گیراوەو من زانیومە، لێیگەڕێ جارێ هەر تازەیە.

خدر: من داوای لێبوردەییت لێ ئەکەم.

نارەوەن(( سەرداخستنێکی کەم)): پارێزەرەکەشم داواکەی بەرز کردوومەتەوە.

خدر: داوای جیابوونەوەکە؟

نارەوەن: بەڵێ.

Cut

دیمەنی- ٣٨٨ – ڕ/ د – ناو سەیارەی نیزام:

(( نیزام و هەڵشۆ))

هەڵشۆ: وەڵا خوا بە کەسی نەداوە وەک خدر حەماڵ! پێیەکی لە وەکالەتەکەیەو ئەویتری لە کۆمپانیا.. بەخوا من بوومایە لە بری ئەو خدرە داواشم ئەکرد، یەکسەر ڕازی ئەبوو.. پیرە جا چییە؟ گرنگ سەروەت و سامانییەتی.

نیزام: کورە کاکە هەڵشۆ خەسووتە خەسوو، ئەوە چییە ئەو قسانە ئەیکەی؟

هەڵشۆ: دە توخوا تۆش؟ خەسوو خەسووت لە چییە؟ بەخوا لە بێگانە بێگانەتر سەیرم ئەکا.. ئای کاک دارەوان تۆ ئەڕۆیت و چی دێتە جێیەکەت؟.. ڕاستیان وتووە ئەڵێن کە خوا بیبڕێ دەنگی دلێران، ڕێوی ڕاو ئەکا لە جێگەی شێران.

نیزام: ئای خوایە کە قسەی سەیرو سەمەرەت لایە؟! کاکە هەڵشۆ.

هەڵشۆ: ئەمەیان هەر زۆر عەنتابییە!

نیزام: کامە؟

هەڵشۆ: ئەو قسە سەیرو سەمەرانە.. (( بەجددی قسەکردن)) تۆ پێم بڵێ، باوەڕ ئەکەی ئەگەر پێت بڵێم ئەو دووە پەیوەندیی خۆشەویستیی لە نێوانیاندایە؟

نیزام: بۆ نا؟ هەموو شتێک ڕێی تێ ئەچێ.

هەڵشۆ: وەرە ئەم قسەیەم بۆ بڵاو بکەرەوەو بڵێ وا ئەڵێن، دڵنیابە هیچ کەسێک سەرچاوەی قسەکەی ناوێ، هەر قسەکەو بەس.

نیزام: جا ئەوە باشییەکەی چییە بۆ تۆ؟ ئەوەندەی من بزانم زۆر خراپ لەسەرت ئەکەوێ.

نیزام: باش بیربکەرەوە.. کە قسەکە بڵاوبۆوە، من ئەچم بە خەسووم ئەڵێم، هەڵبەت ئەویش لەبەر سومعەی خۆی لەو هەتیوە دوور ئەکەوێتەوەو ئەوسا (( بێدەنگیی))

نیزام: ئەوسا چی؟

هەڵشۆ: خۆ پیاوی تیا نەماوەماڵەکە.. خۆم ئەبم بە ڕەجەبی سەرپاڵاو هەموو سامانەکە ئەکەوێتە بەردەستی خۆم.

نیزام: کورە خەڵک چۆن بۆ پارە ئابڕووی ماڵە خەزوورانی خۆی ئەبا ئەی هاوووووار!!!

هەڵشۆ: تۆش هەر لەگەڵ خۆما ئەبی و نەک هەر بێبەشت ناکەم، بەڵکو بە تەواوەتی ئەتحەسێنمەوە.

نیزام: دەی سا وەڵڵاهی باشترین بیرۆکەت داناوە کاکە هەڵشۆ، ئەو هەموو ئەقڵە چییە ئەی هاوووووار!! (( لەگەڵ ئەی هاووووارەکەی پێشوودا بە یەک نەغمە ئەیڵێ))

Cut

دیمەنی – ٣٨٩ – ڕ / د – ڤێللایەک لە دەشت و دەر:

(( دیمەنەکە بەهارییە.. نارەوەن و خدر جلی بەهارەیان لەبەردایە.. لە شوێنێکدا بە پێوە وەستاون))

نارەوەن: جا دەمی هەر کەسێک ئەکەیتەوە، ئەڵێ ژنی پیاوکوژەکە، ئەوەم پێ قبوڵ ناکرێ؟

خدر: لەبەر مناڵەکان، کەمێک هێمنتر بیر بکەرەوە.

نارەوەن: مناڵی چی؟ ئەو لە سێدارە ئەدرێ.. دوای ئەوە خۆت ئەزانی دوو کوڕەکە دوکانیان فرۆشت و سەری خۆیان هەڵگرت و کەس نازانێ لە کوێن.. من و تیرۆژی داماو ماوینەتەوە، تریفەش لە ماڵی خۆیەتی و لەبەر قاوەخانەکە خۆی هەر سەرێکیشمان لێ نادا.. ئیتر بۆ لەناو خەڵکیشا من ژنی تاوانبارە لە سێدارەدراوەکە بم، ئەوسا قوڕەکە هەر بۆ من و تیرۆژ ئەگیرێتەوە.

خدر: ڕاستە.. وەک پارێزەرەکەش ئەڵێ مارەییەکەت بە کاش لەو پارەیە دەرئەچێ کە دەستی بەسەراگیراوە.

نارەوەن (( پێکەنین)): ئەیچۆن ئەوەش زۆرە. ئەرێ ئەوەتیرۆژ هەر خەوتووە دیارە.

خدر: ڕەنگە.. دەی کەواتە داوای جیابوونەوەکە بابڕوا ئەگەر هەر سووریت لەسەری؟

نارەوەن: کورە پارێزەرەکە ئەیوت، ئەوەندەی نەماوە، تەڵاقەکەت بۆ وەرئەگرم، ئەیوت ئەگەر سێ ساڵ بەرەو ژووریش حوکم بدرایە هەر بۆم وەرئەگرتی، ئەوە یاسایە.. جا ئەم کە حوکمی لەسێدارەدانیشی هەیە، ئەوە هەر هیچ.. بۆیە تا زوو وەری بگرم باشترە.. ئێستا زۆر دڵخۆشم.. تەنها خەفەتم ئەوەیە بۆ ئەوەندە ڕێزی ئەو زوبێرە ناپاکەم گرت لە ژیانما؟

خدر: ئەوەندە بیری لێ مەکەرەوە، من وتم بیری خۆتی بەرەوە.. مادام هەموو شتەکانیشیان پێ فرۆشتی بەو تالانفرۆشییە، تۆش دڵت پاک بێتەوە، کاک زوبێر خۆی ئەو نرخانەی بۆ دانابوون، وەک خۆیان وتیان.

نارەوەن: ئاخر ئەیەوێ چاو بەرەوژێرییەکەی ڕاستکاتەوە، من قەت بە پارە ناتوانم لە هیچ کەسێک خۆش بم، ئەوەم باشە.

خدر: هەڵەیەک بووەو کرا.. ئەگەر منت بە کوڕی خۆت قبوڵە، تکایە ئیتر دڵت پاک کەرەوەو باسی مەکە، با بیریشت چێتەوە.

Cut

دیمەنی – ٣٩٠ – ش/ن – ماڵی تازەی زوبێر:

(( چیمەن و ڕێژوان و بروسک))

بروسک: بەڕای من کۆمپانیای هاوشێوەی ئەوەی باوکت نەکەینەوە.. با لەگەڵ نارەوەندا بەریەککەوتنەوە ڕوونەدا.. وەک کۆمپانیاکەمان بە تالانفرۆش پێشکەشکردو خانوومان گواستەوە، بۆ شوێنێکیتر تا نەشزانێ لە کوێ ئەژین.. بۆچی خۆمان لە هەمان ئیش وەردەینەوە، کە ئەو ئەیکات..

ڕێژوان: ئەی چی بکەین؟.. ئەگەر ئیشێک نەکەین پارەش ئەخورێت و ئەبڕێتەوە.

بروسک: پیشانگەیەکی گەورەی مۆبایل بۆ تۆ ئەکەینەوەو منیش سەفەرەکان ئەکەم و بەردەوام پیشانگەکە پڕ ئەکەمەوە.

سەلوا: ئەوە زۆر باشە.. ئیتر لە هەموو کێشەکان بە دوور ئەبن.

چیمەن: ئیتر ئەبێ ئیشێ بکرێ خۆ هەر وا دانانیشن.

ڕێژوان: جا مسۆگەرە؟

بروسک: ئیشێکی زۆر مسۆگەرو پاکەو بە ڕۆژێک فێری هەموو وردەکارییەکانی ئەبیت.. سەلواو چیمەنیش ئەتوانن بچنە پیشانگەکەو ئیش بکەن، گەر حەزیان کرد..

چیمەن: من پێم ناکرێ لەبەر (( دەست بەسکیا ئەهێنێ)) ئەم وەزعەو کە مناڵەکەش بوو ئەوە هەر هیچ.

سەلوا: دە با بڕۆین ڕێژوان، دایکت تەنیایە.

چیمەن: دە پەلەتان چی بوو خۆ زۆر زووە جارێ؟

سەلوا: بەخوا کەمێکیش نەساغە ناکرێ ئاوا جێی بێڵین.

ڕێژوان: باشە سەرێکی باوکم ئەدەم لە مواجەیاو بەویش ئەڵێم.

بروسک: من باوکت باش ئەناسم، چۆن دڵی خۆشکردی و وتی برۆ بە نهێنیی ژنەکەت بگوێزەرەوە، ئاواش دڵنیام ئەمەشی زۆر پێ خۆش ئەبێت.

ڕێژوان: بەوهیوایە.

چیمەن: ئەی تۆ بڵێی کاردۆش لەگەڵتانا بەشدار نەبێ؟

ڕێژوان: بۆ کاردۆ لەوەتای ژنی هێناوە کەس ئەیبینێ تا قسەی لەگەڵ بکەین.

چیمەن: بەخوا ئەو برایەمان قەت بە ئێمەوە نەنوساوە.

بروسک: دەی کاری بەخێر بێ، زۆر بێدەنگ و بێوەیە.

(( هەستان و خواحافیزیی کردن))

Cut

دیمەنی – ٣٩١ – ڕ/ د – بەردەرگای زانکۆ:

(( تایەر لەسەر ڕێی تیرۆژ وەستاوە))

تایەر: دڵخۆش نەکەی بیرم چووبیتەوە.. تا ئەکوژرێم لەسەر تۆ، سەر ڕێگەت بەرنادەم دڵەکەم.. شەقی زۆریان لەسەر تۆ تێهەڵدام، بەس خۆشەویستیت زاڵتر بوو.

تیرۆژ: تۆ ناوت چییە؟

تایەر: تایەر!

تیرۆژ: باشە تایەر هەفتەیەک مۆڵەتم بە، با بیری لێ بکەمەوە.. نایەیتە سەر ڕێگەشم، ئەگینا هەموو شتێک هەڵئەوەشێتەوە.

تایەر: کچێ وەی بەسەرچاو.. هەر لە ئێستاوە بیر بکەرەوە، وا من ڕۆشتم.

(( تایەر بە پەلە ئەچێتە ناو سەیارەکەی و تیرۆژ پێئەکەنێ))

——— Cut ———

دیمەنی – ٣٩٢ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان و هاوڕێ و چەند کەسێکیتر لەوێن، حەمەخدر بە کراس و پانتۆڵێکەوە شیک، دێتە ژوورەوە.. بەخێرهاتنی گەرم))

خدر: ئەردەڵان بارێکی باشمان بۆ هاتووە خۆت حازرکە، تەممەڵیی تیا نەکەی.

ئەردەڵان: بەخوا کاک حەمەخدر زۆر ماندووم با پشوویەک بدەم لە خزمەتتام.

خدر: کورە ئەردەڵان تووڕەم مەکە، ئێستاش هەر حەمەخدرەکەی جارانم، هەر ئەوەندەی دەمار گرتمی، یەکسەر عەرەبانەکە ئەهێنمەوەو هەمووی بار ئەکەم.

هاوڕێ: وەڵا لە دەستت دێ، خۆ ئەم هەموو پارەیە هیچ نەیگۆڕیت ماڵم ئاوا کردی.. یەکجار ئاوا سادەو خاکییش مەبە.

خدر: هەر بەو سادەییەوە گرەو ئەبەیتەوە هاوڕێ گیان.. توخوا بەو دەم و لچ هەڵاوساوانەشت ئەوت پیاو، کە پێشتر لە گوزەرەکەدا بوون؟

هاوڕێ: ئاخر حاڵیان جوانە، کامیان ماوە لە زیندانێکا نەبێ.

ئەردەڵان: کورە کاک حەمە خدر، ئەوان تووڕەشت بکردنایە خۆیان دەستیان نەئەدایە ڕەش و سپییەوە، خۆ وەک تۆ نەبوون.

خدر(( پێکەنین بۆ هاوڕێ)): ئاگات لە مام پیاوە ئێستاش ئەوانی لە من پێ باشترە؟ههه

هاوڕێ: حەددی نەبێ بەوانیشەوە.

(( خدر ئەچێت و بە سوعبەتەوە یەک دوو بۆکسی پیا ئەکێشێ و دەست ئەکاتە ملی و لەگەڵ خۆی ئەیبا ))

Cut

دیمەنی – ٣٩٣ – ش/ن –ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان))

هەندرێن: ئیتر دنیا ئاوایە ژنەکە، ڕۆژێک دژت ئەوەستێتەوەو ڕۆژێک بە دڵی تۆ ئەگوزەرێ.

تافان: دەی وەڵاهی سوێند ئەخۆم ئەو خدرە هەرچی پارەی هەیە، هی ئەو ژنە سەرلێشێواوەیە.

هەندرێن: ماڵیان ئاوا بێ خۆ جێی منیان کردۆتەوە لای خۆیان، ئەی ئەگەر ئەوەش نەبووایە، چیمان بکردایە؟

تافان: ئەی جێی منی بۆ نەکردەوە؟ یان هەر حەزی لە پیاو دامەزراندنە.

هەندرێن: مەسەلە پیاو و ژن نییە، بەخوا جاری وا هەیە بە حەفتەش نایبینم.

تافان: ئاخر دیارە ئێمە ئەبووین بە مووی بەر لووتی.

هەندرێن: توخوا بەسیەتی ئەم باسە داخەو بیبڕەوە، ئەرێ هەموو شەوێک لە ئیش ئەگەڕێمەوە، لەبری چێشت و نان، ئەم باسەم بۆ گەرم ئەکەیتەوە.. ئەوە هیلاک نەبووی؟

(( باڵاو کڵپە بە چەپڵە لێدان دێنە ژوورەوە))

هەردووکیان: هێی هێی دیسان شەڕە،ئەمەیان شەڕی دایک و باوک کوژییەکەیە هههه.

(( پێکەنین و جەو گۆڕین لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٣٩٤ – ش/ن – ژوورێکی زیندان:

(( ڕۆستەم و سالم))

ڕۆستەم: ئەو مردوو مراوەش بۆ هەر کەسێکی ئەناردین، بەلایەکی بەدواوە بوو.. باش بوو سەری نەئەگرت، ئەگینا بەخوا ئێستا وەک دارەوانەکە لە چاوەڕوانیی پەتی قەنارەدا ئەبووین.

سالم: ماڵی ئاوا بێ، ئەبێ مەمنونی بین.. هیچ نییە دەی! پێنج ساڵ پێچی مێزەرێکە.

ڕۆستەم: ئاخر تۆ بڵێ هەتیو بە ژیانت مێزەرت بەستووە تا بزانی بە چەند ساڵ ئەیبەستی؟ قسەی تورەهات مەکە، پێنج ساڵ زۆر زۆرەو ماڵ و منالم ڕیسوا ئەبوون گەر حەمە خدر فریایان نەکەوتایە.. کورە ئەوەیە پیاو، ئەشهەدوو خزمی باش هەر هەبێ باشە.

سالم: کورە تۆ بۆ قەناعەت ناکەی، گەر خدر خەبەری لێ نەدابین، کێ ئەیزانی زوبێر بە نیازی کوشتنی خەڵکە؟

ڕۆستەم: جارێ خدر قەت ئەوە لەگەڵ منا ناکا بابزانی.. ئینجا خۆ حوکمەتیش نەنوستووە، بەخوا ئاگای لە سروتری هەموو کەسێکە.

سالم: ئەی بەچی وا دەوڵەمەند بووە، کە نەزانێ پارە بخاتە کوێوە؟

ڕۆستەم: تۆ تێناگەی نا.. ئەو ژنە بۆی بووە بە خێروبەرەکەت و بڕایەوە.

Cut

دیمەنی – ٣٩٥ – ڕ/ د – گوند:

(( دیدەوان ئەیەوێ بزنێک بگرێت.. چەند ڕائەکا بەدوایا بۆی ناگیرێت.. شوانەکە کەمێک دوورە))

دیدەوان(( بۆ بزنەکە)): ئەوە بۆ ڕائەکەی نەگبەت؟ خەریکە بە دەستی خۆت خوێنی خۆت ئەخەیتە کاسەوە! (( پاش کەمێک هەوڵی تر)) تورەم مەکە، من دیدەوانم دیدەوان، وامەکە لەبەردەمما بپاڕێیتەوەو هیچ دادیشت نەدا (( کەمێکیتر ڕا ئەکا بەدوایا.. باش، هەر زۆر باشە بزنە لات... (( بۆ شوانەکە)) ئا وەرە تۆ ناوت چییە؟ وەرە.

شوان: مەحمود مامۆستا گیان.

دیدەوان: چەقۆی گەورەت پێیە؟

شوان: بەڵێ مامۆستا ئەبێ پێمان بێ.

دیدەوان(( ئاماژەی بزنەکە ئەکا)): ئا ئەو بزنە گەڕەم بۆ سەربڕەو کەوڵیکەو مام تەیفورو جەماعەتیشی بۆ بانگکە بۆ نیوەڕۆ.

شوان: مامۆستا گیان ئەوەیان گوناحە تازە زاوە، لەبەریەتی.

دیدەوان: یەکجاریتر قسە لە قسەما بکەیتەوە، نایەیتەوە سەر ئێرە باش بزانە، من یەکجار قسە ئەکەم.

شوان: بەخوا گوناحە مامۆستا گیان، بەڵام لەبەر قسەی جەنابیشت بەسەرچاو.. خوا خۆی ئاگای لێیە، من بێبەریم لەو گوناحە.. هەر ئێستێ!

(( شوان ڕائەکا بەدوای بزنەکەیاو ئەیگرێ))

Cut

دیمەنی – ٣٩٦ – ڕ/ د – پارکێک:

(( تایەرو تیرۆژ))

تیرۆژ: بەڵام من حەزم لەوە نییە زۆر درێژەی پێ بدەیت و بخایەنێت.

تایەر: کچێ بڵێ بەیانی، بڵێ ئەم ئێوارەیە.. ئەمرت بە هەرچی بێت وا ئەکەم.

تیرۆژ: ئەبێ بگۆڕێیت تایەر، ئەوەندە هەڵەشەو جرپنیش نەبی.

تایەر: بزانە چۆن ئەگۆڕێم؟ بە جۆرێک بە خەویش نەتبینی بێت.

تیرۆژ: ئەچیتەوە زانکۆو ئەمجارە تەواوی ئەکەیت، منیش ئەبێ خوێندنم تەواوکەم.

تایەر: بەسەرچاو، منیش حەز ئەکەم.. ئەی منالْ؟

تیرۆژ: جارێ باسی منالْ بە هیچ جۆرێک ناکەیت، تا ئەکەوینە سەرپێی خۆمان.

تایەر: من لەسەر پێی خۆمم ئەهاههه(( بەسەرداگرتن ئامازەی باڵای خۆی ئەکا))

تیرۆژ: سوعبەت کەم ئەکەیتەوە، پێکەنینت لەناو خەڵکا ناهێڵێت، خەندەیەک و تەواو، ئەگەر وا نەبیت خەڵکی ئێستا بە جۆرێکی باش تەماشات ناکەن.. ئەگەر خەڵکت لە ئاستی خۆی بە بەرزتر تەماشاکرد، دڵنیابە زۆر بچوک ئەتبینن، کەس بە گرنگ مەزانە دەوروبەرەکەی خۆت نەبێت، نهێنیی خۆت بە کەس ناڵێی ......

تایەر(( قسەی پێ ئەبڕێ)): بوەستە تیرۆژ گیان بوەستە، یەک یەک.. ئەو هەمووەم بە جارێ پێ لەبەر ناکرێ و هەر لە بیریشم ئەچێتەوە.....

(( بەدەم ڕێوە پێکەنین و دایالۆگ لە میوتیدا))

_______ Cut _______

دیمەنی – ٣٩٧ – ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( بێستان و کرمانج هاتوون بۆ لای تریفە جلی ڕەشەو لەسەر مێزێک لەگەڵیا دانیشتوون))

تریفە: نا نا.. زۆرتان ماندوو کردم، بێنەو بەرەی زۆر بوو.

کرمانج: ئەوەش پێویست بوو، تا دڵنیابن هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویانداوە لە پشتی تۆوە بوون و تۆ بێ ئاگا بووی.

بێستان: وەک ئەوەی من، کە بەو هەموو سەیتەرەیەیا تلیاکم بۆ گواستوونەتەوە، کچێ منیش هەر مردم، تا ڕێشارو باوکت دانیان پیا نابوو، کە من و تافان هەر بۆ ئەوە دامەزرێنرابووین.

تریفە: بەداخەوە باوکم نەئەبووایە ئەوەی بکردایە، لە هیچ شتێکی کەم نەبوو.

کرمانج: پارە بەرچاوی لێڵ کردبوو، هەر کەس لە فەرمانی دەرچووایە ئەیکوشت.

(( بە بێتاقەتییەوە قسەکردن لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٣٩٨ – ڕ/ن - چێشتخانەیەک:

(( خدرو نارەوەن لە چێشتخانەیەک خەریکی خواردنن))

خدر (( سەرسوڕمان)): دوووو جار!!!!؟

نارەوەن: ئای، دووجار دارکاری کراوە لەسەری و لە مردنیش گەڕاوەتەوە، کەچی هەر کۆڵی لێ نەداوە.

خدر: ئای ماڵی خۆشەویستیم ئاوا کرد جێ بە پیاو ئەکا؟!

نارەوەن(( بە دزە نیگاوە)): هەر بەپیاو نا بە ژنیش هههههه.

خدر: ئەی دێنە پێشەوە؟

نارەوەن: بەڵێ.. ئیتر سەرەی تۆیە.. ئێستا تۆش لە هیچت کەم نییەو ئەتوانین ژنێکی جوان و ناسکت بۆ بێنین.. خۆم بۆت ئەدۆزمەوە، ئەزانم تۆ بۆی ناگەڕێی.

خدر: وازم لێبێنە، ئێستام زۆر باشترە، دڵنیات ئەکەم تۆ نابینی من ژنم هەبێت.

نارەوەن: ئیتر ژیانم زۆر ئارام ئەبێ وا کچەکەش ئەڕوا،(( کەمێک دەست بەسەریەوە ئەگرێ و بێتاقەت))

خدر (( پەرۆش)): ئەوە چی بوو نارە خان؟

نارەوەن: نازانم، لەدوای بیرکردنەوەوە لە کچەکە کە ئەڕوا، وام لێدێت.. دەی ئەوە شتێکیترە.. تۆ پێم بڵێ ئیش تەواو.. عەسر بچین بۆ کوێ؟

خدر: ئەگەر تاقەتت هەیە بچین بۆ شانۆگەرییەکەی ڕیکلامەکەیمان بینی. خراپ نیە.

نارەوەن: باشە، تۆ دێیت بە شوێنما یا من بێم؟

خدر: هەر خۆم دێم بە شوێنتا.

نارەوەن: دەی کە ئێستا منت بردەوە، سەرخەوێ ئەشکێنم و سەعات چواری ڕێک چاوەڕێت ئەکەم.

خدر: باشە.. خۆ مەسەلەی دارەوانت تەواو؟ مەبەستم ئەوەیە ئیشی لای پارێزەرەکەت نەما؟

نارەوەن: نا نا ئەم بەیانییە هەموو شتێکی بۆ تەواو کردم و نیوەڕۆش هات، هەق و حسابم لەگەڵ کرد.

خدر: کەواتە هەستە با بڕۆین، با پشوویەک بدەین، منیش ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووم.

نارەوەن (( هەڵئەسێ)): جارێ من بگەیەنە.

خدر: ئەیچۆن؟.

(( هەڵئەسن و دێن حسابەکە ئەدەن))

تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٣٩٩ – متبوع - ڕ/ - بەردەرگای چێشتخانە:

(( سەیارەی خدر، بەرزێکی ڕەش وەستاوەو سەیارەیەکیتریش هەیە.. بەدەم ڕێوە))

نارەوەن: پیرۆز بێت یاخوا، بەڕاستی ئەم سەیارەیە هەر زۆر نایابە، شتێکی واش بۆ من بکڕە.

خدر: دیارە زۆرت بەدڵە.. پێشکەشت بێ و بۆ خۆم شتێکیتر ئەکڕم.

نارەوەن: ئەی ماڵت ئاوابێ، دڵم نەهات وا بڵێم.

خدر: ئێی کەواتە شەرمم لێ ئەکەی.

نارەوەن: نا شەرم نییە، بەڵام وتم خۆی حەزی لێیەتی با داوای نەکەم.

خدر: هەرچیم هەیە هی خۆتە نارەخان، ئەو قسانە چییە؟ بە تۆ بێ و بە من بێ هەر یەکە.

نارەوەن: دەی کەواتە تۆ سەیارەکەی من بەرە.

خدر: وای لێ ئەکەین، با بگەینە ماڵەوە.

نارەوەن: ئەچین سەرێکی مەخزەنەکە ئەدەین، بزانین بارەکە تەواو بووەو دەرگاکانیان باش داخستووە؟

(( سواری سەیارە ئەبن و نارەوەن لێی ئەخوڕێ وئەڕۆن.. سەیارەیەکیتر دوو گەنجی تیایە دوایان ئەکەوێ))

ــــــــ تابع ــــــــــــــــــــــــ Cut ــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٤٠٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئۆفیسی تازەی وەکالەت، بەرامبەری کۆمپانیاکەی ڕێشارە، کەمێک بەلای خوارووتردا، لەسەر شەقامە سەرەکییەکە.. لە تەنیشتی ئۆفیسەکەوە، فەرعێک ئەچێتەوە سەر شوێنی بارکردن.. هەندرێن بەپێوەیەو خۆی کۆ ئەکاتەوەو دێتە دەرەوە، دەرگای ئۆفیس جوان دائەخات و خۆی دڵنیا ئەکاتەوە لەوەی جوان داخراوە، ئەحەو کارە لێی نزیک ئەبنەوە))

کارە: قوربان گیان ئەڵێم کرێی بارەکانی ئەمڕۆمان نادەیتێ؟

هەندرێن: ئەهـ ماڵم ئاوا نەکردن باشە؟ ئەی بۆ تۆزێ زووتر نەهاتن؟ ئەبێ دووبارە بیکەمەوەو هەموو بزانم چەند بارەو چەند نییەو ئاخر توخوا ئەمە ڕەوایە.

ئەحە: دەی عەزێت مەکێشە، بەیانی بماندەرێ.

هەندرێن: جا بەیانیش هەر ئەمڕۆیە فەرقی چییە؟

کارە: نا کاکە هەندرێن، بەیانی پێش ئەوەی یەکەم کاروان بکەین، ئەم حسابەیان ئەکەین، قەیچێکا؟

هەندرێن: دە باشە وەڵا هەزارجار.

(( خواحافیزیی لێ ئەکەن و هەندرێن بە پێ بە شەقامەکەدا ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٤٠١ – ڕ/ د- ناو سەیارەکە:

(( ئەگەنە بەردەمی مەخزەنێکی داخراو))

خدر: تۆ دامەبەزە، من ئەچم بزانم مەحکەم داخراوە؟

نارەوەن: جوان دڵنیابەرەوە.

خدر: ئا.. ئا..

(( خدر ئەڕوات و نارەوەن لە ئاوێنەوە دیقەتی ئەو سەیارەیە ئەدا کە دوایان کەوتبوو، سەیارەکە بە دووریی ٥٠ مەترێک لە پشتیانەوە وەستاوە.. خدر دەست لە قفڵی مەخزەنەکە ئەدات و ئەگەڕێتەوە سەرئەکەوێت))

نارەوەن: بە هێمنیی لە ئاوێنەکەوە بڕوانە، ئەو سەیارەیەی لە پشتمانەوە وەستاوە.

خدر (( تەماشا ئەکات)): ئەو دووانە کێن؟

نارەوەن: نایانناسم، هەستم کرد لە چێشتخانەکەش هەبوون.. پێش وەستانمان بینیم ئەوانیش خاوی ئەکەنەوەو ئەوەستن.

خدر: دە تۆ وەرە جێگەکەم با من لێخورم، کە تۆم داگرت خۆم ئەزانم چۆن سەریان لێ ئەشێوێنم. (( شوێن ئەگۆڕنەوە))

نارەوەن: چەکت پێیە؟

خدر: هەر دەمانچەکە.

نارەوەن: حازریکە، وابێ یەکێکمان فریای شتێک بکەوین.

خدر(( لە چەکمەجەی داشبڵ دەری ئەکات)): هیچ نابێ کچێ، کەی ئەوەندە ترسنۆک بوویت؟

نارەوەن(( دەمانچەکە وەرئەگرێت و میل ڕائەکێشێ)): بەخوا دڵم باش نالێ.

(( ئەکەونە ڕێ)) ——————— Cut ———————

دیمەنی – ٤٠٢ – ڕ/ د – بەردوکانی ئاواو ئامۆ:

(( شەنیا بەوێدا ئەڕوات و دوکانەکە ئەبینێ داخراوە))

<u>**شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە**</u>:

خۆ هەتیوە شێتەکەشی لێ نییە.. مانگی پێشووش هاتم هەر داخرابوو، چیان لێهاتبێ، دە کەیفی خۆیانە، پەیوەندیی بە منەوە چییە؟ من هەر یەکجار بینیم، چەند ویستم جارێکیتر بیبینمەوە، خۆی خزاندۆتە ژوورەوەو هەر نایەتە دەرەوە ئێسکی خواتەوە.. دەی خۆ منیش بە ڕێم ئێرە بێ، بمەوێ بیبینمەوە، ئەگینا کوا بیرم ئەکەوێتەوە؟

<u>**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو**</u>:

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٤٠٣ – متبوع - ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دارەوان:

(( لە ناو سەیارەکەوە.. خدر کە نزیکی ماڵی نارەوەن ئەبێتەوە، سەیارەکە ئەبینێ بەرەو ڕوویان لە نزیکی ماڵەکە وەستاوە.. کە نزیک ئەبنەوە هەردووووکیان بە دەمانچە تەقە لە سەیارەکەی ئەمان ئەکەن))

خدر(( پێش تەقەکان لەگەڵ دابەزینی دووانەکەدا، سەری نارەوەن دائەنەوێنێ بۆ ناو بەرپێی سەکن و خۆیشی هەروا )): سەر دانەوێنە تەقە ئەکەن.

(( ئەوان بەردەوام ئەبن لە تەقەو لە دەرەوە سەیارەکەیان نیشان ئەدرێ ئەڕۆن))

# (( ئەڵقەی بیست))

(( دوای تەقەکان، خدر سەرێک هەڵئەبڕێ، ئەبینێت سەیارەکە بە خێراییەکی زۆر دەرئەچێت و ئەڕوا، ڕاست ئەبێتەوەو بانگی نارەوەن ئەکا، نارەوەن بوراوەتەوە))

خدر: نارەوەن هەستەوە ڕۆشتن (( وەڵام نییەو خدر ترسی لەبەر ئەنیشێت، بە دەنگێکی ترساوەوە)) نارەوەن، نارە، نارە (( ڕاستی ئەکاتەوەو بۆ خوێن ئەگەڕێت، تەماشای گیانی ئەکا هیچی پێوە نییە، یەک دوو زللەی سوکی لێ ئەدات و لەگەڵیا بانگی ئەکا)) نارە نارە گیان هەستەوە، نارە نارە!

(( بەدەم ڕاوەشاندن و بانگکردنیەوە لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤٠٤ – ڕ/ د – بەردەم ئۆفیسی وەکالەت:

(( چەند کەسێک وەستاون و هەندرێن دێت بۆلایان))

هەندرێن: هیچ نەبووە، هەردووکیان زۆر سەلامەتن و لە خەستەخانەش هاتوونەتەوە.. فەرموون هەمووتان بڕۆنەوە، ئەمڕۆ ئیشەکان ئەوەستن، سبەینێ نارەوەن خان خۆی دێتەوەو لە کۆمپانیاکەی ئەتوانن ببینن.. هەرکەسیش پارەی ماوە وەریگرێ، با لەگەڵ من بێت.. دەی کاکە بڵاوەی لێ بکەن با قەرەباڵغیی دروست نەبێ.

فەرمان: بەڵام کاک هەندرێن من زۆر زەرورم، خەڵکم ڕاگرتووە، ئەبێ هەرچۆنێکە ئەوەی من دابینکەی برا.

هەندرێن: کاکە فەرمان وەک وتم ئەمڕۆ هیچ شتێک ناکرێ و نافرۆشرێ، باوکم خوا لە مردن گێڕانیەوە، تۆ داوای شتی چی ئەکەی، بڕۆ قەناعەتیان پێ بکە سبەی بێنەوە.

فەرمان: بە چی قەناعەتیان پێ بکەم کاکە؟

هەندرێن: ئەوە ئیشی خۆتە فەرمان گیان (( بۆ ئەوانیتر)) دەی کاکە کێ پارەی ماوە با بێت وەریگرێ. (( ئەچێتە ئۆفیسەوەو یەک دووانێک دوای ئەکەون، بڵاوە ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٤٠٥ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆزو کرمانج))

کرمانج: بەڵێ گەورەم، هاکا پەیا بوون.

سەرکۆ: هیچ سەرەداوێک دەست نەکەوت؟

ڕاهۆز: گەورەم تەنها ئەوەمان زانی بەپێی قەوانە فیشەکەکان هەردووکیان ١١ فیشەکیان تەقاندووەو فیشەکەکان ئەمەریکین و هیچی بەر سەیارەکەشیان نەکەوتووە.

کرمانج: گەورەم لەو بڕوایەدام ڕێشار شتێک بزانێت. بانگی بکەینەوە بۆ لێکۆڵینەوە.

سەرکۆ: ئەوەی ڕێشار ئەیزانێ، تۆش ئەیزانی.. بۆچی ڕێشار؟

کرمانج: وەک بینیت، فرتوفێڵی زۆرە.. یاری و گەمە کردنی هەیە.. من تا ئێستاش پێم سەیرە وا بە ئاسانیی بردینیە سەر شوێنی دارەوان.. هەست ئەکەم ئەوە تەواوی چیرۆکەکە نەبێت.

سەرکۆ: ئەی گومانی چیت هەیە؟

کرمانج: من بە حوکمی ئەوەی زۆر تێکەڵی ئەو کابرایە بووم، ئەگەر هیچیتر ڕووی نەدایە، هەستم ئەکرد زیاد لە پێویست شتەکان قووڵ ئەکەمەوە.. بەڵام کە ڕوویدا، ئێستا هەست ئەکەم باش لە ڕێشارم وردبوومەتەوە.

ڕاهۆز(( بۆ کرمانج)): گەورەم تۆ گومانی ئەوە ئەکەیت لە پشتی دارەوانیشەوە کەسیتر هەبێت؟

کرمانج: ئەگینا دوای چەند ڕۆژێک لەگرتنی باندێکی وا گەورە، کێ زاتی ئەوە ئەکا، تەقە لەو دووە یان هەرکەسێکیتر بکا؟

سەرکۆ: ڕائید کۆژین با ڕای تۆ بزانم.. بۆچی تەقەیان لێکرا؟ هەڵبەت هۆکارێکی گرنگ هەیە.. بۆ نمونە، بە پەیوەندیی حەمەخدرو نارەوەنیان زانیووە بە ئێمەوە؟

کرمانج: نەخێر گەورەم.. ئەوی بۆ تەقەکردنەکە ڕایسپاردوون، زۆر بە ئاسانیی ئەیتوانی ئێم فۆرێک، یان هەر چەکێکی ئۆتۆماتیکیتریان بداتێ و بیکوشتنایە.. ئەمە ئەگەر بە پەیوەندیی ئەوانیان بزانیایە بە ئێمەوە.

سەرکۆ: ئەی بۆ چ مەبەستێک ئەچی؟ من ڕام وایە بیانەوێت دۆخێکی نائارام بۆ خدرو نارەوەن دروست بکەن.

کرمانج: بەڵێ گەورەم، بەڵام چ دۆخێک؟.

ڕاهۆز: بەڵام ڕەنگە ئەم ئیشە بۆ دارەوان کرابێت و ئەوان وابزانن خدرو نارەوەن زۆر نزیکن لەیەکەوە.. بە دەلیلی ئەوەی یەک فیشەک بەر سەیارەکەشیان نەکەوتووە.

کرمانج: ڕاستە ئەمە ڕێی تێ ئەچێ.. بەڵام نارەوەن سادەو داماو نییە، ئەو کۆمپانیایەک و دوو لەسەر سێی وەکالەتەکەشی هەیە، هەروا بە ئاسانیی نایخاتە بەردەستی حەمەخدرو هەموو کەسێک ئەمە ئەمە ئەزانێ.. بە دارەوانیشەوە.

سەرکۆ: بۆ نا؟ ڕەنگە کەسوکاری دارەوان گومانیان دەست بڵاویی لە نارەوەن هەبێت و بیانەوێ بەمە پێی بڵێن ئێمە زیندووین.

کرمانج: من ئێستا هەستەکانم نامبەنەوە سەر ئەوە.. لەوانەیە قسەی جەنابیشت بێ گەورەم.. بەڵام قسەی جەنابتە، لەو حاڵەتەدا ئەوە خزمەکانی دارەوانن ئەوە ئەکەن.

((لەناو مناقشەی میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤٠٦ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و خدرو تریفەو تیرۆژو هەڵشۆ))

نارەوەن (( قاقالێدان)): وەڵا من هەر تۆقیم.. ئاخر قەت تەقەم لێ نەکراوە، ناحەقم نییە کاکە گیان، ئیتر بەسە گاڵتەشم پێ مەکەن.

تریفە: نا من ئەو شتەم بینیوە دایکە قەت ناهەقت ناگرم.

خدر (( پێکەنین)): ئاخر ئێوە نازانن پێشتر چۆن هەر خۆی بە قارەمان ئەزانی و گاڵتەی بە من ئەکردو پێی ئەوتم ترسنۆک؟ ئەگەر ئەزانن؟!!!!!!

هەڵشۆ: بابە ئەوە مەسەلەی گاڵتە نییە، وەڵاهی خوا ئەزانێ چ خێرێکی گەورەتان کردووە وا خوا پاراستنی؟

نارەوەن: نەوەڵا لە خێرکردنا ئەبەد کەمتەرخەمیمان نەکردووە.

تیرۆژ: ئاخر پیاوەتی برا جوانەکانمانە بەجێیان هێشتین و خستینیە بەردەمی سەگ و گورگی ئێرە.. چی ئەبوو ئێمەشیان ببردایە؟!

تریفە: ئێستا کاتی ئەو قسانە نییە.. جارێ با بیر لەوە بکەینەوە چۆن بتوانین خۆمان بپارێزین و جارێکیتر ڕووبەڕووی مەرگ نەبینەوە.

خدر: خەمی ئەوەتان نەبێ.. سبەی من و دایکت هەموو شتێک چارەسەر ئەکەین.

هەڵشۆ: حسابێک بۆ ئێمەش بکەن کاکە! (( پێکەنینی کاڵ))

نارەوەن: واز لە حمەخدر بێنن با خۆی هەموو شتێک ڕێکبخا، کە زۆر بووین هەر یەکەو قسەیەکی تیا ئەکاو سەرمان لێ ئەشێوێ.

هەڵشۆ: بەڵام خۆ ئەبێ منیش ئاگادار بم.. ئەی خەسووی من نیت؟

نارەوەن: کورە من دایکیشتم ڕۆڵە خەسووی چی ئەگەر شیرت پاک بێ؟ هههە بەڵام حەمەخدر سەری لەو شتانە دەرئەچێ، ئەوەتا منیش ناچم بەلایا.. با هەر خۆی بێ.

هەڵشۆ (( کەمێک گرژ)): دەهەستە تریفە بابڕۆین.. خۆیان چارەسەری ئەکەن.

تریفە (( هەڵئەسێ)): باشە ، ئەرەوەڵا با بڕۆین قاوەخانە کەسی لێ نییە.

نارەوەن: ئەوە چییە ئەوە چیکەڵانە تەنگییە هەڵشۆ؟ عاجز بوویت؟

هەڵشۆ: نەوەڵا، بەس کە پێویستتان بە ئێمە نەبێ، بچین بەلای ئیشمانەوە باشترە.. ڕەنگە تۆو کاک حەمەخدریش قسەی تایبەتیی خۆتان هەبێ.

نارەوەن (( کەمێک ڕامان)): ناشێ دڵت لێ پیس کردبین هەڵشۆ؟!

هەڵشۆ: نا من هەقم چییە بەسەرتانەوە.. بەڵام ئەوەی خەڵک دەربارەی ئێوە ئەیڵێ، هەڵبەت دوو دانیشتنی وایان بینیون.

خدر: برا نارەخان لە ڕێکی ئەوەیا نییە قسەی بۆ هەڵبەسترێ و منیش هەر وەک دایکی خۆم سەیری ئەکەم، خەڵکیش چاوی دەرئەهات هەرچییەک بڵێ، قسەی گیرفانی خۆیانە. (( لەم قسانەدا نارەوەن هەر سەری ژەنیوەتە ئەرز))

هەڵشۆ: ئیتر بڕۆ ئەو ڕوونکردنەوانەت بۆ خەڵک باسکە، من خەسووی خۆم باش ئەناسم کە چەند سادەو ساکارە.

تریفە: دایکم لە ئاوی شەوێ پاکترە.. کەس حەددی نییە بڵێ بەری چاوت بە کلە.

تیرۆژ: هەرکەس ناوی دایکم بە جۆرێک بەرێ، سەری ئەخەمە قەبری ئاژدادیەوە.

هەڵشۆ: قسەی من نییە.

نارەوەن: کورم زۆر دڵنیابە یەکەم: خدر چاوی لە سامانی من نییە، هەر زۆر زۆر لەوە دڵنیابە من باش ئەیناسم.. دووەمینیش بێ ئسووڵیت کرد لەبەرچاوی منا ئەو هەموو شەکرەت شکاند.. من زۆر دەمێکە ئەزانم تۆ زۆر بێ ئەدەبی، بۆیە خۆم لێ ئەپاراستی نزیکت نەکەومەوە، بەڵام دەرکەوت لەوە بێ ئەدەبتری کە دەربارەت ئەمزانی.. من سەربەست و ئازادم، ئەم کوڕەش لە ئامۆو ئاوا فەرزترە بۆ من (( هەڵشۆ ئەیەوێ قسە بکا)) وس! بێدەنگبە سەرسەریی.. ئەوە من و خدرین گاڵتەمان بەوجۆرە

پەیوەندییانەی خەڵک دێت، کە هەر ژن و پیاوێک یەکتر ئەناسن، ئیتر وابزانن حەز لێکردەن.. فەرموو هیچ دەم هەڵنەهێنیتەوەو ملت بشکێنە.

تریفە (( سەرسوڕمان)): دایکاااا!

نارەوەن (( بە هێمنیی)): تۆش بێدەنگ بەو بڕۆن.

هەڵشۆ (( دائەنەوێتەوە دەستی نارەوەن ماچ بکا، نارەوەن دەستی ڕائەپسکێنێ)): زۆر ببورە نارەوەن خان، بەخوا بەس ویستم ئاگادار بیت خەڵک لە پشتەوە چۆن باستان ئەکەن.. چەند شەڕێکیشم لەسەر کردوون.

نارەوەن(( بە هێمنیی)): ئێستا بۆ دەرەوە، ئەعصابم زۆر گەرمەو با شتی ناخۆشیش ڕوونەدا.. بڕۆن تا دڵم چاک ئەبێ.

هەڵشۆ (( لەگەڵ تریفە لە ڕۆشتندا)): بەهەرحاڵ من مەبەستم خراپ نەبوو، بەو هیوایەی تێبگەن نیەتم پاک بوو.

(( دوای ڕۆشتنی تریفەو هەڵشۆ، تیرۆژیش هەڵئەسێ))

تیرۆژ: من ئەچم ئەنووم، هەرکاتێ خەوت هات من هەستێنە ئاگام لەماڵەکە ئەبێ.

خدر: نا تیرۆژ گیان، مامی خۆت لێرە ئەبێ، هەردووکتان بنوون و من بە ورياییەوە لە هۆڵەکە ئەبم.. چۆن دڵم دێت جێتان بهێڵم تا پاسەوانتان بۆ دائەنێم.

نارەوەن: ماڵت ئاوا بێ خدر گیان.. بووین بە یەک کۆڵ خەمی گەورە بۆ تۆ.. باوەڕبکە پاسەوانمان ناوێ، دەرک و بان جوان دائەخەین و خوانەخواست هەرشتێکیش ڕوویدا، تەلەفون بۆ تۆ ئەکەم.

خدر: نا شتی وا نابێ، بۆ دڵنیایی ئێوە ئەمشەو لێرە ئەبم.

نارەوەن: بەسەری تۆ ناهێڵم، تۆ شەوێک لێرە نەماویتەوە وا زاواکەم قسە دروست ئەکا، جا وەرە ببیستێ شەوێ لێرە بوویت حەی حەی.

(( لە میوتیدا دایالۆگ و دواتر بەڕێکردنی خدر)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٤٠٧ – ڕ/ د – بەندیخانە:

(( مواجهةی ڕێشار هەیە، شامورادی تەمەن ٥٠ ساڵ لەگەڵ ڕێشاردا کەمێک سووکتر بە دەنگی نزم قسە ئەکەن))

ڕێشار: تۆ بچۆ بۆلای ئەوان و خۆیان ئەتبەن بۆ لای پاشا.. بە پاشا بڵێ، من براکەی ڕێشارم.. من پاشای تازەم نەدیوەو نایناسم، بەڵام کاک دارەوان وتی لەو ڕێگەیەوە ئەگەنە لای و بە وشەی نهێنیی "سمۆرە" متمانەتان پێ ئەکاو وەرتان ئەگرێ.

شاموراد: ئیتر خۆی هەموو شتێک ئەخاتە بەردەستم؟

ڕێشار: تۆ بڕۆ بەو ناونیشانەی پێم وتی و هیچ خەمت نەبێ، .. (( بە دەنگی ئاسایی)) شاموراد گیان پارێزەرێکی باشم بۆ پەیاکەن حوکمەکەم بۆ تەمیزکاتەوە، ئەوەندەی نەماوە کاتی تەمیزکردنەوە بەسەرچێ، ئەم پارێزەرەم زۆر سستە.

شاموراد: خەمی ئەوەت نەبێ ڕێشار گیان.. هەرچیمان پێ بکرێ ئەیکەین.

ڕێشار: دەی باشە ئێستا بڕۆو خوا ئاگای لێت بێ.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی ڕێشارو شاموراد))

Cut

دیمەنی – ٤٠٨ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی تایەر:

(( تایەر خۆی گۆڕیوەو بەرەو دەرەوە ئەچێ.. باوکی دێتە ناو دەرگاکەو بانگی ئەکا))

باوک: وەرە کوڕم وەرە، ئەمڕۆ ماڵی مامە سەلیمت دێن بۆ نیوەڕۆ.

تایەر: باشە باوە گیان خەمت نەبێ، ١٢ ی ڕێک لە ماڵەوە ئەبم موقەدەر نەبێ.

باوک: ئیشەڵڵا هیچ نابێ، بڵام ١٢ی چی ڕۆڵە؟.. خێرا بچۆ بۆلای فازیلی جەڵەبچی شەریکم.

تایەر: ئەو بۆ؟

باوک: بڵێ باوکیشم بە تەلەفون پێی وتووی ئەمڕۆ سەلیم ئاغای برام دێت لە خزمەتی ئەوا ئەبم ناتوانم بێم.. ڕاشمسپاردووە دابەستەیەکم بۆ لەتوپەتکا تا تۆ ئەچی.

تایەر: یەعنی جارێ بچم گۆشتەکە بێنمەوە؟

باوک: ئا ئا ئیتر دوای ئەوە بچۆ بەلای کاری خۆتەوە.

تایەر: ئای خوایە گیان، وەڵاهی ئیشی دنیام هەیە.

باوک: ئەزانم ئیشی تۆ هەر ناو چەتیوە ڕشکنەیەو تەواو نابێ.. گۆشتەکە بێنەوەو ئیتر بۆ کوێ ئەچی بچۆ.

تایەر (( بەدەم ڕۆشتنەوە)): باشە باوە گیان.. وا ئەچم بۆ ئەوێ لە پێشا.

(( تایەر ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٠٩ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان))

هاوڕێ: کەس نەما کەس.. نە دارەوان و نە محەناشوکرو نە ئامۆو ئاواو نەبروسک و نە کرمانج و خەریک بوو حەمە خدرەکەش تیا بچێ.. ئای زەمانە چۆن بێ باک بێ باک وەرئەچەرخێی.

ئەردەڵان: کورە نە زوبێرو نە ڕێشارو نەسەرەو مالەو نە ئەحەو کارە ئەوانیش هەر لەوبەرەوەن.. جا کێ ما؟

هاوڕێ: بیرم لەوە کردۆتەوە چاخانەکە بگوێزمەوە بۆ لای ئۆفیسەکەی ئەوبەر، ئەگەر جێم دەستکەوێ.

ئەردەڵان: ئەگەر وا ئەکەی ئەم دەوروبەرە هەر جێهێڵە، زۆر سەر بە کێشەیە.

هاوڕێ: کورە بابە من هەقم چییە بەسەر کێشەوە، من کاسبی خۆم ئەکەم، ئێرە هەر زۆر چۆڵ بووە.. چۆڵ و هۆڵ.

ئەردەڵان: وەڵا ڕاست ئەکەی.. دە بە حەمەخدر بڵێ، بەخوا ئەو جێگەت بۆ پەیا ئەکا، تۆی خۆش ئەوێ.. خوا هەڵناگرێ منیش گیانێکم بەوە.

هاوڕێ: بەخوا وای لێ ئەکەم، ئەگینا کرێی ئەم مانگەم بۆ نادرێ.

ئەردەڵان: بەخوا بەخوا کرێکەشت ئەداتێ، خەمت نەبێ بەدەستودڵە.

(( حوار لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤١٠ – ش/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کرمانج و ڕاهۆزو دارەوان))

دارەوان(( سست)): ئەو نامەیە بۆ نارەوەنە نەک ئێوە.

سەرکۆ: تۆ لەو نامەیەدا ئەڵێی من پاشا نیم و نە کەسم کوشتووەو نە کەسم ڕفاندووەو نە بازرگانیشم بە ماددەی هۆشبەرەوە کردووەو نە ئاگاداری هیچ تاوانێکیتریشم.. ئەڵێی ئەمەم بۆ پاراستنی تۆو منداڵەکان کرد، ئەگینا ئێوە تیا ئەچوون..ئەگەر بتوانی ئەمە بسەلمێنیت، لەو پەتی سێدارەیە خۆت ڕزگار ئەکەی، کە دوای هاتنەوەی بڕیارەکە لە دادگای تەمیزو دەرچوونی مەرسومەکە، پەت ئەخرێتە گەردنت.. بیسەلمێنە دارەوان، بەوە خزمەتی خۆت و دادپەروەیی و شکۆی خۆت و خێزانیشت ئەکەی. کات نەماوە درەنگە.. ئەو کەسەی ئەوانەی کردووە کێیە؟

دارەوان: بە بێ ئەوەی نارەوەن بزانێ کە ئێوە ئاگاداری ئەم نامەیەن.. لە ڕێگەی پۆلیسەوە بیگەیەننە دەستی، ئەوکاتە هەموو شتێکتان بۆ ڕوون ئەکەمەوە.

سەرکۆ: دارەوان سوود لە گەمەکانت نابینی.. کاتت زۆر لە بەردەمدا نەماوە.

دارەوان: ئەوەی وتم وەک خۆی جێبەجێی بکەو هەموو شتێکت پێ ئەڵێم.

کرمانج: کاک دارەوان هاوکارییمان بکە، دڵنیابە ئازاد ئەکرێی، هیچ تۆمەتێکت بەسەردا ساغ نابێتەوە، تەنانەت ڕێ ون کردنی دادپەروەریش.. ئەگەر بەڵگەی سەلمێنراومان بدەیتێ دادگاییت دووبارە ئەکرێتەوە.. بیسەلمێنە بە بەڵگەوە کەسێکیتر ئەو تاوانانەی ئەنجامداوەو تۆ نیت.. بەڵام بەڵگەی حاشاهەڵنەگرمان بدەرێ.

دارەوان: بمبەنەوە شوێنی خۆم، هیچ قسەیترم نییە.

ڕاهۆز (( بۆ سەرکۆ)): گەورەم ئەمرت بەچییە؟

سەرکۆ: بیبەنەوە بۆ زیندان و نامەکەش بدەنەوە بە زیندان، با بە ڕێگەی خۆیان بینێرن بۆ نارەوەن.

(( بردنە دەرەوەی دارەوان لەلایەن ڕاهۆزەوە ))

کرمانج: ئەمەش گەمەیەکیتر، با بزانین چی لەژێرسەرایە؟!

سەرکۆ: لەو بڕوایەدا نیم بتوانێت هیچ بە هیچ بکا.. ڕەنگە بەشدارێک هەبێت لە تاوانەکانیدا، ئەو هەموو بەڵگانەی لەسەر خۆی هەن، تازە ڕێی دادگایی کردنەوەی هەموو داخستووە.. بەڵام بەڵکو شتیتری لێ دەربکەوێ، خراپ نییە بەدواداچوونی بۆ بکەن.. ئەو ئێستا بێ هیوایەو گەر کەسیتر شک ببا، لەوانەیە بیدرکێنێ.

کرمانج: بابزانین ئەمانگەیەنێتە چی؟

Cut

دیمەنی – ٤١١ – ش/ن –ماڵی پاشا:

(( پاشا هەر بە دەستوری خۆی ماسکێکی تورەکەیی لەسەردایە، ئەگەر جگەرەی چروتی ئەسڵیی بەدەستەوە بێ باشترە، سەر زمان بگرێ باشترە بۆ ڕێ ونکردن، لایەکی نیشان بدرێ.. شاموراد بە پێوە قسە ئەکا، دوانیش بە دەمامکەوە لە پشتیەوە وەستاون))

شاموراد: بەڵێ پاشای گەورەم هەر ئەمرێک بفەرموون.

پاشا(( بۆ یەکێک لە دوو کەسەکە)): بە دارایی بڵێ با دوکانێکی گەورەی لەنگەی بۆ دابنێن.. (( بۆ شاموراد)) خۆشت چوار کەس بێنە بۆ هاوکاریی کردن.. لەم یەک دوو ڕۆژەدا هاوکاریی باشت پێ ئەگات و خانوت بۆ دابین ئەکرێ.. پاش مانگێکیش سەیارەت بۆ ئەنێرم، با جارێ ئەم شڕەیەی خۆت پێ بێ.. ئێستا بڕۆ.

شاموراد(( بە سازشەوە)): ئەمر ئەکەیت گەورەم، بەو هیوایەی بتوانم لە ڕێشاری برام زیاتر خزمەتتان بکەم.

(( دوو پاسەوانەکە چاوی بە پەڕۆیەکی ڕەش ئەبەستنەوەو ئەیبەنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٤١٢ – ڕ/ د – ناو سەیارە ڕەشەکەی نارەوەن:

(( نارەوەن بە مۆبایل))

نارەوەن: ١- ئیتر من نازانم ڕاست ئەکا یان نا، ئەڵێ هەڕەشەی ئەوەم لێکرابوو ئەو تۆمەتانە نەدەمە پاڵ خۆم، ماڵ و منالّم هەموو بکوژن....... ٢- کورە چاوی ئەو کەسە دەرئەهات هەر قسەیەک بکا، ڕۆڵە تۆ بۆ خەڵک ئەژیت یان بۆ خۆت؟ ئەوەتا من و خوشکەکەت لەوپەڕی مەترسیداین، ئێوەش قنگتان گرتۆتەوەو نایەنەوە، (( بە گاڵتە پێکردنەوە)) وەڵا لەبەر قسەی خەڵک....... ٣- بەڵێ ئەزانم شوێنتان زۆر باشەو درۆش ئەکەی خەمی ئێمەشتان نییە، هەرکەس بۆ خۆی خۆشبێ، ئێوە چوزانن ئێمە چۆن شەوانە ڕۆژ ئەکەینەوەو چۆن لە ڕۆژیشا لە سێبەری خۆشمان سڵ ئەکەینەوە.............. ٤- دەی با پێت بڵێم، وا نزیکە داواکاری تیرۆژ بێنە پێشەوەو تەنها چاوەڕوانی چارەنوسی باوکت ئەکەن.. لەو سەرا گەورەیەشدا هەر خۆم ئەمێنمەوە.. جا چارەسەری منیش ئەوەیە، یا هەرچی ماڵ و موڵکێ هەیە بیفرۆشم و بێمە لای ئێوە، یان پیرەمێردێ بدۆزمەوەو شوو بکەمەوە، ئێوە بەوە ڕازین؟ دەی ئیتر کەیفی خۆتانە بیرێکی لێ بکەنەوە.......... ٥- دەی کەواتە تۆ دوو هەڵبژاردەت خستە بەردەستم، یان لەناو ئەم ژاوەژاوەدا بکوژرێم، یان دەرگاو پەنجەرە لەسەر خۆم داخەم و تەرکی دنیاکەم.. دەبا پێت بڵێم ئامۆ! من نەمئەویست بە هەموو ژیانم جارێکیتر شوو بکەمەوە، بەڵام مادام ئەوە دەم و زمانەکەی ئێوەیەو ئاوا پشتتان تێکردم.. شەرت بێ ئەو شووە بکەمەوەو پیاوێک بێنمە سەر ئەم نازو نیعمەتە.. کوڕم خۆ ئەبێ پیاوێکم بە دیارەوە بێ بمپارێزێ ............ (( نارەوەن لە کاتی قسەکانی ئامۆدا زمان دەرئەهێنێ و وەک موشکیلەی دروست کردبێ، دڵخۆشە)) ٦- ئیتر کەیفی خۆتانە ئەوە دوابڕیارمە........ Cut

دیمەنی – ٤١٣ – ڕ/ ن – ماڵێک لە ، ماڵی ئامۆو ئاوا لە میسر:

(( ئامۆ بە مۆبایل))

ئامۆ: ١- بەڵام خەڵک ئەوە نازانێ....... ٢- کچێ دایە گیان تۆ نازانی لەو چەند ڕۆژەی دوای گرتنی باوکم خەڵک چۆن تانەوتەشەریان لێ ئەدایین و چیان پێکردین؟.. هەر وەختا بوو شێت بین، خۆ لە خۆشیا سەری خۆمان هەڵنەگرت.. باوەڕت بێ هەر کەسێکیتر لەبری ئێمە بووایە، هەر خۆی ئەکوشت.. ئێستاش دڵنیابە بە هیچ جۆرێک ناگەڕێینەوە ئەو شوێنەی لە دەستی هەڵاتم، ئێستا شوێنمان زۆر باشەو تەنها خەمی تۆو تیرۆژمانەو هیچیتر........... ٣- با دایە گیان وا مەڵێ، ئێمە دڵمان لاتانەو بەردەوامیش باستان ئەکەین، نا وا مەڵێ........... ٤- هەرکەسێک تۆ بێنێ چاوی لەدوای سامانەکەتە، خۆت باش ئەوە ئەزانی، بۆ ئێرەش هیچ عەمەلیی نییە بۆ تۆو هەر دڵت شەق ئەبا.. دایکە بەراستیی غوربەت ئینسان ئەکوژێ....... ٥- دایە گیان هەڵە مەکە، تازە تۆ لە ڕێزەی شووا نەماوی بیکە بەخاتری خوا.. بوەستە پەلەم لێ مەکە، با لەگەڵ ئاواشدا قسەیەکیتر بکەمەوە، بەڵام دڵنیابە لە هەموو حاڵەتێکدا گەڕانەوەی ئێمە زۆر قورسە، بڵێ مەحاڵیشە.........

Cut

دیمەنی – ٤١٤ – ش/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( هەڵشۆو تریفە دانیشتوون، شوێنی کاشێر))

هەڵشۆ: تریفە گیان هەر بە نەرمیی تێیگەێنە. بڵێ خدرێکی حەماڵی سەگباب، هەر ئەسڵەن لەو ئاستەیا نییە بێتە ماڵی ئێمەومانان.. جا چ جای پشتی پێ ببەستین؟ بڵێ هەڵشۆ هەر کوڕی خۆتەو ئەتوانی متمانەی پێ بکەی هەموو ئیشەکانی پێ بسپێری.

تریفە: هەڵشۆ تۆ زۆر سەیری، وا ئەزانی دایکم یەکسەر بە قسەم ئەکا؟ ئەو خدری لە کوڕەکانیش خۆشتر ئەوێ بەساقە، ئەڵێ دەستنێژی خۆمەو ئەیدەم بە دارا ئەیدەم بە بەردا نقەی لێوە نایەت.

هەڵشۆ: دەی ئەگەر ئەو هەتیوە تەماعی کردبووە سەروەت ساماناکەتان و زەبرێکی وەشاندو ڕایکرد؟! ئەوسا چی ئەکەن؟

تریفە: نازانم.. تەنها ئەوەندە ئەزانم دایکم لەوە کارقایمترە گەنجێک لە خشتەی ببا.

هەڵشۆ: تۆ بچۆ.. ئەوانەی پێ بڵێ بەڵکو لە کەلی شەیتان بێتە خوارەوەو دەست لەو هەتیوە هەڵگرێ.

تریفە: باشە من هەر کاتێک بێ سەرێکی ئەدەم، بەڵام دڵنیابە چۆن ئەچم ئاوا دێمەوە.

هەڵشۆ: دەی تۆ ئەوە نیەتی دڵت بێ، هەر نەچی باشترە.

تریفە: بەقوربان بۆ من حەز ناکەم هەرچی هەیەو نییە بیخاتە بەردەستی خۆمان، بە تایبەت کە کوڕەکانیش لێرە نیین؟

هەڵشۆ: دەست لە کوڕ بشۆ، من قسەم لەگەڵ کردن، ئەڵێن تا ماوین بە سەردانیش نایەینەوە.

تریفە: دە ئاخر منیش دایکی خۆمە باشی ئەناسم، زۆرم بۆ مەهێنە کە بیکەم بە شەڕیش لەگەڵیا.. بەس خۆم ئەزانم بڕیاری دایکم بە من ناگۆڕرێ.

هەڵشۆ: تۆ هەستە بچۆو قسەی زۆر بۆ بکە، بەڵکو سا ئەمە خوایە بێتە باری قەناعەت.

تریفە: باشە ئەوەش ئەکەم.

Cut

دیمەنی – ٤١٥ – ش/ن –ماڵی بروسک:

(( بروسک و چیمەن))

بروسک: ئا، ڕێژوان قسەی لەگەڵ باوکت کردووە، بیرۆکەکەی پێ باشە.. بەڵام ئەو وەک خۆی حەزی هەر لەو جۆرە بازرگانییەیە کە پێشتر ئەیکرد.. وتویەتی پارەی منی تێ مەخەن و بۆم هەڵگرن، کە هاتمە دەرەوە کۆمپانیاکە بە ناوی یەکێکتانەوە دائەنێمەوە.

چیمەن: ئەی ئەوەی هەیە بەشی ئەوە ئەکا تۆ لە خەیاڵتایە؟

بروسک: خەمی ئەوەت نەبێ چیمەن گیان.. زۆر لەوە کەمتریشم پێ بوو دەستم پێکرد.. ئیتر ئیش ئاوایە، گەر لە هات بوو، هەر خۆشت نازانی چۆن بەسەرتا ئەڕژێ.

چیمەن: ئەی بۆ لە پارەکەی باوکم شتێک ڕاناکێشی و دواتر بیدەیتەوە؟

بروسک: نا قەت ئەوەی لەگەڵ ناکەم، ئەی ئەگەر ئیشەکە باش نەهاتە دەست ئەمجارەیان.. چۆن لە ڕووم بێ تەماشای باوکتکەم؟

چیمەن: دەی مادام وایە خێری پێوە بێ.. دەست لەدەست و قوەت لەخوا.

بروسک: سبەی دوکانەکە بۆ ڕێژوان یەکلا ئەبێتەوەو پڕی ئەکەینەوە.. مەرجیش نییە هەرچیمان هەیەو نییە تێی فرێدەین، بەپێی بازاڕ ئەجوڵێینەوە.. جارێ وەک سەرنجێکی خێرام لێدا، هەم شوێنەکەو هەم ئیشەکە خراپ نییە.

چیمەن: خەمی تۆم نییە، لەسەر بەردی ڕەق نان پەیا ئەکەی.. بەس ئەو ڕێژوانە داماوە گوناحە، زۆر دەست و پێ سپییە.

بروسک: وا چاوی ئەویشت بۆ ئەکەمەوە ببێ بە دانی مار.

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤١٦ – ش/ن – ژووری بەڕێوەبەری زیندان:

(( کرمانج و ڕاهۆزو دارەوان لەسەر کورسیی و قەنەفە.. کەس نەچووەتە جێی بەڕێوەبەر))

کرمانج (( کاغەزێک نیشانی دارەوان ئەدا)): ئەوەش ئیمزای نارەوەن کە نامەکەتی وەرگرتووە.

دارەوان (( خەمساردانە)): ئێ ئێستا کێشەتان چییە؟

کرمانج: ئەی تۆ نەتوت ئەوکاتەی کە دڵنیا بوومەوە نامەکەی منی بەدەست ئەگات، هەموو شتێک ئەڵێم؟

دارەوان (( پێکەنینی گاڵتەپێکردن)): بەڕاستی ئێوە باش ئەقڵتان پێ ناشکێ هههه.

ڕاهۆز: تۆزێک بە ئەدەبەوە قسە بکە نانەجیب.

دارەوان: ڕۆڵە تۆ ئەزانی چەند داماون؟ کاتێ پێتانوایە کابرایەک بە دەستی ئێوە ئەکوژرێت و چاوەڕوانی شتێکی لێ ئەکەن؟ ئەزانی چەند دەماغسزییە کاتێک وابزانی مردوویەک ڕێزت بگرێ، یان ڕێزی هەر گەورەیەکت.. ئەزانی لای من ئێستا هیچ کەسێک گەورەو بچوک نییە.. تۆ ئەزانی چوونە دەرەوە لە ژیان مانای چییە؟ تۆ ئەزانی .....

کرمانج (( قسەی پێ ئەبڕێت)): تۆش کەسانێکت لە ژیان کردۆتە دەرەوەو ئێستا باجەکەی ئەدەی، گەر ڕاست نییە ئەتوانی پێچەوانەکەی بە بەڵگەوە بسەلمێنی.. ئەوکاتە بزانە چ هاوکارییەکت ئەکەم؟

دارەوان (( بە تەشەنوجەوە)): هەی بەڕێز! بەڕێزی بەڕێزەکان.. من ئەوەم بۆ ئەوە کرد، تا نارەوەن بە ژیانی نەحەسێتەوە.. بۆ ئەوەی بە هەموو ژیانی لە گومانا بژی و پەشیمان بێ لەوەی بەرامبەرم کردی.. بۆ ئەوەی تا ئەمرێ ویژدانی ئازاری با.

کرمانج (( هەڵئەسێ)): هەستە نەقیب ڕاهۆز.. گوێ لە مردوو ناگیرێ. ـــــ Cut ـــــــ

دیمەنی – ٤١٧ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەتەکە:

(( نارەوەن و حەمە خدر))

خدر: نا.. نا.. پێویستیمان بە پاسەوان و ماسەوان نییە.

نارەوەن(( دڵتەنگ)): ئەوە زۆر باشە، بەڵام هەرچەند دڵنیاشیان کردمەوە نامەکەی بۆ تێکدانی هاوسەنگیی دەروونیی منە.. کەچی هەر لەو باوەڕەدام بەشێک لە ڕاستی تیایە.. قەت دارەوان ئەو دڕندەیە نەبوو کە دەرکەوت، شتێکی تیایە.

خدر: کەواتە نامەکەی زۆر بە باشیی ئامانجەکەی پێکا.

نارەوەن: کاکە من چەند ساڵە لەگەڵ ئەو پیاوەیا ئەژیم.. سروشتی زۆر شارەزا بووم، هیچ شتێکی ناسروشتیم لێ نەبینی، ئاخر ئەمە قسەیە.... بە ژیانی ئەوەندە تووڕە نەبووە لەبیرم بێت ئەوەی ئەم دوادواییەی نەبێ، لەسەر هاتنی تۆ، کە هەر پێشم نەوت کێ بوو هات.

خدر: ئەزانم.. ئەی ئێستا دەسەڵاتمان چییە؟ هەموو بەڵگەکان لە دژی ئەو بوون، تەنانەت دانیشی پیاناوەو تاوانی زۆر گەورەشن.

نارەوەن: ڕاستت پێ بڵێم؟

خدر: ئەزانم دڵتەنگی دارەوانیت.. هیچ بڕیارێک مەدە ئێستا. جێبەجێ کردنەکەی ڕەنگە بکەوێتە مانگی داهاتووەوە، ناکرێ لە ئێستاوە ئاوا دڵتەنگ بیت.

نارەوەن: بە ڕاستی بێتاقەتم.. ئەمەوێ کوڕەکانیشم بێنمەوە بەهەر شێوەیەک بێت. هەرچەند چوونەتە سەر دارێکی عاسیی و نایەنە خوارەوە.

خدر: ئەی چی ئەکەی؟

نارەوەن: کوڕەکان نایەنە ڕاستەڕێ و ناگەڕێنەوە.. واباشە لە سەرەتای هەفتەی داهاتووەوە ئێمە بچین بۆ لای ئەوان.. بە ڕاستی ئەمەوێ هەموو پێکەوە لێرە بین و

ڕێزی ئەو هەموو ساڵەی لێ بگرم کە پێکەوە بووین و ڕێزی گرتم.. (( ئەگری)) نامەوێ کفن و دفنەکەی سارد بەڕێوە بچێ.

خدر: باشە دایکەکەم تۆ دڵی خۆت سەغڵەت مەکە.. پاسپۆرتەکەتەم بدەرێ، با سەفەرەکە ڕێکخەم.. تەواوی ئەو هەفتەیە لای کوڕەکانبە.. ئەی تیرۆژ؟

نارەوەن (( هێور بوونەوە)): تیرۆژ با لە ماڵی تریفە بێ.. چی بکەم ناکرێ ئەویش بێت، دوا ساڵیەتی.. بەڵام تۆش خۆت ئامادەکە.

خدر: بەسەرچاو ئەوە کێشە نییەو من ئامادەم، بەڵام ئەی ئەگەر نەهاتنەوە؟.

نارەوەن (( کەمێک بیرکردنەوە)): خۆم ئەزانم ئەیانهێنمەوە.. کوڕەکان باوکیان خۆشئەویست.

خدر: بەڵام تاوانبارە.. چۆن پرسەکەی دائەنێی؟

نارەوەن: پرسەی چی؟ من تەنها کفن و دفنەکەی ئەکەم و ئەمەوێ پێش ئەوەی بخرێتە ناو گۆڕەوە، چرپەیەکی بۆ بکەم.

خدر: دە بچۆ سەرێکی لێ بدە.. ڕەنگە ئارام بیتەوە.

نارەوەن: وا بکەم؟

(( دایالۆگ لە میوتیدا))

——— Cut ———

دیمەنی – ٤١٨ – ڕ/ن – زیندان:

(( زوبێر لە زیندان نامە ئەنوسێت، بە دەنگ لەبەر خۆیەوە ئەیڵێتەوە))

زوبێر: بەڵێ، لە دارای دنیادا لە چیمەن ئازیزترم شک نەبردووەو شکیشی نابەم نارەوەن گیان.. ئەوە دارەوانی هاوڕێی مناڵیم بوو ویستی دوای ئەو هەموو ساڵەی متمانە پێکردن کچەکەم بکوژێ.. باش بوو تۆش ئەمەت زانی.. ئەزانی هەوڵدان بۆ کوشتنی ئازیزانت، چۆن ئەقڵی مرۆڤەکان ئەشێوێنێ و دنیایان لێ ئەهێنیتەوە یەک؟ بەگەورەیی خۆت بمبورە لەو هەوڵە مایەپووچەم بۆ کوشتنی تریفە.. دارەوان ویستی بە فڕاندنی من پەکبخا، بۆ ئەوەی تلیاکەکەی  کە لەو بارەدا بشارێتەوەو بێ مەترسیی بگاتە دەستی.. کاتێ بە هەڵە بۆ من دەرکەوت دارەوان بروسکی نەفڕاندووەو ڕێشار بوو، ئەزانی من چ بارێکی دەروونیم بەسەردا هات؟ ئەزانی کە تۆو دارەوان و تریفەم ئەبینی، چەند بەخۆدا ئەشکامەوەو خەجاڵەتتان ئەبووم؟ هەموو هەوڵێکم ئەدا تا ئەو ئازارە دەروونییەم سارێژکەم، بەڵام بێسوود بوو.

Cut

دیمەنی – ٤١٩ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن تەماشای نامەکە ئەکات و بە دەنگی زوبێر ئەخوێنرێتەوە))

دەنگی زوبێر: نارەوەن ئێستا من لەم دابڕانە کۆمەڵایەتییەمەوە، لەم وەحشەتە موستەحەقەوە، لەم یادکردنەوەی وردو درشتی یادەوەرییەوە.. ئەمەوێ پێت بڵێم من جگە لە سزا یاسایی و دەروونییەکان، سزایەکیتریش ئەچێژم، کە ئەمەیان توندترینیانە.. ئێوە بەشێک بوون لە من، ساڵانی دوورودرێژیی ناسیاویی و ئاشنایەتیی و دۆستایەتیمان، یەکماڵیی ئێمە ئەسەلمێنێ.. دڵنیابە نارەوەن گیان ئەگەر دارەوان تەنها لەسەر ڕفاندنەکەی بروسک سزا بدرایە، هەر لە سەرەتاوە لێی خۆش ئەبووم و نەمئەهێشت یەک ڕۆژ زیندانیی بکرێت... ئەوەی مەبەستمە من دوو سزای گەورەم چەشت لەسەر ئەو شڵەژانە دەروونییەی ئەو کەتنەی پێکردم.. تکا ئەکەم سزای سێیەمینم مەدە، بە دوورکەوتنەوەی خۆت و مناڵەکان.. بەرگەی ئەوەش ناگرم.. ژیانم ئەبێتە چۆڵەوانییەکی تاقەت پڕوکێنەری بێ نمود.. پێمخۆشە تەنها لە نێوانی من و ئێوەدا، نەک لەبەردەمی یاسادا، لێم خۆش ببیت و لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدەیتەوە، کە تیایدا من براو باوک و دۆست و پارێزەری ڕاستەقینەتان بم.. تکایە متمانەم پێ بکەنەوە.. تکایە هەرکاتێ دڵتان پاک بووەوە، یان ئەرک بکێشەو سەردانێکم بکە، یان بە نامەیەک گەورەییتم بۆ دەربخە.

برات زوبێر.

(( لە کاتی خوێندنەوەی نامەکەدا، نارەوەن تفاعل لەگەڵ مانای دێڕەکاندا ئەکا.. لە کۆتاییشدا بزەیەک ئەکات و سەر بائەدا))

Cut

دیمەنی – ٤٢٠ –ش/ن - ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان و کلێپەو باڵا))

تافان: باشە ئەو پیرێژنە چی ئەوێ؟ لەلایەک تەڵاق وەرئەگرێ و لەلایەکیترەوە ئەیەوێ خۆی پرسەکەی بۆ بگێڕێ و خەڵک ناچار بکا سەرەخۆشیی لێ بکەن!

هەندرێن (( لە کاتی قسەکانیدا لە دەرگا ئەدرێ)): کچێ ژنەکە تۆ بۆ نازانی کەمێ ورد بیربکەیتەوە، ئەی باوکی منالێەتیی و چەند ساڵ پێکەوە بوون، چۆن ئەوە بیرئەچێتەوە بە وەرگرتنی تەڵاق و مەڵاق؟

کلێپە (( چووەو دەرگا ئەکاتەوە)): باوکە پورە سەلواو کاکە ڕێژوانە.

(( هاتنە ژوورەوەو بەخێرهاتنی گەرم و ماچ کردنی مناڵ و دانیشتن))

هەندرێن: پیشانگەکەت دانا ڕێژوان؟

ڕێژوان: بەڵێ بەڵێ.. هەموو شتێکمان بۆ هێناوەو سبەی یەکەم ڕۆژمانە.. سەلواش لەگەڵمایە.

هەندرێن: ئەک بە خۆشیی بێت یاخوا، سەر بەڕزق بێ و خێرباتەوە.

سەلوا: بەخوا کاک بروسکیش هاوکاریی زۆری کردین، چاک ماندوو بوو لەگەڵمانا.

ڕێژوان: ئەی خۆ من هەر هیچی لێ نازانم، بیرۆکەی ئەو بوو.. ئەگەر زانیم باش نییە باوکم کە گەڕایەوە کۆمپانیاکە ئەکاتەوە، بەخوا ڕێک ئەچمەوە سەر ئیشە کۆنەکەی خۆم، من هەر ئەوە ئەزانم.

تافان: وەڵا ئیشی کۆمپانیا خۆشترە، نە ئەو هەموو کڕیارەو نە دەمەدەمی معامەلە کردن و نەسەرئێشە. هیچی ناوێ.

سەلوا: با جارێ بزانین چۆن ئەبێ، هەر لە ئێستاوە بێ ئومێد مەبە ڕێژوان.

ڕێژوان: نا نا خوا ئەکا باش ئەبێ؟!!!

بالآ: با منیش بێم بۆ دوکانەکەتان، بزانم مۆبایلی جوانتان هەیە؟

ڕێژوان (( یاری لەگەڵ ئەکاو ختوکەی ئەدا )): ئاخر تۆ مۆبایلت بۆچییە چوزانی جوان و ناشرین چییە سەرەسەبیل؟!

تافان: ئەوە بەڕاستتە، بۆ ئەوەندەی ئەو لێی ئەزانێ، من سەری لێدەرئەکەم؟

(( لە میوتیدا سوعبەت و پێکەنین و دیالۆگ ))

Cut

دیمەنی – ٤٢١ - ش/ن - ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆی تەمەن ٥٠ ساڵ یان بەرەو ژوور))

گێلاس: بە هەر نرخێک بوو، ئەبێ بیکڕینەوەو بچینەوە ئەو خانووە.

ئاکۆ: تۆ پەڵپی چیت لەو خانووە گرتووە گێلاس گیان؟ بۆ گەڕەکێکی زۆر خۆش بوو؟ ئەی بیرت چووەوە هەر دادو بێدادت بوو لەدەست قسەوقسەلۆکی نارەوەن؟

گێلاس: بەڵێ نارەوەن!! کورە هەر من نەمزانی بۆ خۆم بژیم! بڕۆ ئێستا سەیری نارەوەنکە.

ئاکۆ: سەیری چ شتێکی نارەوەنکەم ژنەکە؟ مێردەکەی کە چاوەڕوانی پەتی سێدارەیە؟ یان کوڕە سەرهەڵگرتووەکانی؟ یان خۆی پەنجا کەس خۆی بۆ لە بۆسە ناوەو هەر ڕۆژەو یەکێ تەقەی لێ ئەکا؟

گێلاس: گرنگ ئەوەیە دوای ئەو هەموو بەڵایەش، توانی لەسەر پێی خۆی بوەستێ؟ خۆ وەک منی داماو نییە بەدەست پیاوەوە ناوێرم هەوایەک هەڵمژم!

ئاکۆ: ژنەکە بۆ ناڵێی ئەمەوێ وەک نارەوەن بم؟!

گێلاس: بۆ چیم لەو کەمترە پیاوەکە؟ یەک تۆزێ پارە بخە بەردەستم، بزانە نارەوەن بە شاگرد ڕائەگرم؟

ئاکۆ: ئای خوا لە گێلاس؟! هههە خۆ ئەیەوێ لێم ببێتە نارەوەن.

گێلاس: جیاوازی من و نارەوەن هەر ئەوەندەیە، ئەو پیاوەکەی متمانەی بە هەموو شتێکی هەبوو، کۆمپانیاشی بە ناوی ئەوەوە تۆمار ئەکردو پارەی دنیاشی بۆ هەڵڕشتبوو.. پیاوەکەی منیش پێی ناخۆشە دۆلار ببینم و هەر ناشزانم چی ئەکاو چی ناکا؟!

ئاکۆ: ئاخر بۆیە حاڵی خۆی و پیاوەکەی زۆر جوانە.. ئەگەر هەر ڕۆژێک بێت ئەو ژنە نەکوژرا، بە ناوی خۆمەوە بانگم مەکە.

گێلاس: تۆ لە موزایەدەکەیا خانووەکەم بۆ هەڵگرەوەو با ببمەوە بە دراوسێی.. ئەوسا هەر ناهێڵم پێشی بزانێ، خۆم فێری کاسبییەک ئەکەم لە پەنایەوەو هەموو نهێنییەکی ئیشکردنیش فێر ئەبم.. ئینجا لەخوا بەزیاد بێ شۆڕشی براشم هەیە، باش سەری لە ئیش دەرئەچێ، ئەویش هاوکاریم ئەکا ئەگەر داوای لێ بکەم.

ئاکۆ: بۆ ژنەکە کێشەی پارەت هەیە؟

گێلاس: نا ئاکۆ گیان، کێشەی خۆ سەلماندنم هەیە منیش ژنم و حەز ئەکەم وەک خەڵکیی بژیم.

(( دایالۆگیتر لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ٤٢٢ – ڕ/ د – بەر ئۆفیسی وەکالەت:

(( لە میوتیدا هاوڕێ ئەگاتە بەر ئۆفیسەکەو نارەوەن دێتە دەرەوە و سڵاو کردن و کەمێک وەستان.. حەمە خدریش دێتە دەرەوەو هاوڕێ ئەبینێ و سڵاوکردن.. نارەوەن ئەچێتە ناو سەیارە ڕەشەکەو لە سەکن دائەنیشێ.. حەمەخدرو هاوڕێ قسە ئەکەن و دواتر خدر ئاماژەی باشەی بۆ ئەکات و بە خێرایی دێتە ناو سەیارەکەوە.. لە جێی شۆفێرو دائەنیشێ هاوڕێش ئەگاتە لای نارەوەن))

هاوڕێ: نارەوەن خان گیان ئەمەوێ پرسێکت پێ بکەم دادەکەی من.

نارەوەن: فەرموو هاوڕێ گیان فەرموو.

هاوڕێ: ڕاستییەکەی لەوبەرەوە بازارم نەماوەو ئەمەوێ چایخانەکە بگوێزمەوە بۆ پەنای ئۆفیسەکەی ئێوەوە یان کەمێ ئەولاتر، جا نازانم ئەمرت بەچییە؟

نارەوەن: هاوڕێ گیان ئەیگوێزیتەوە بۆ هەر شوێنێک هەر سنوری کاری ئێمە بێ، لە خزمەتدایە بەقوربان، چیت پێ خۆشە وابکە کوڕم.

Cut

دیمەنی – ٤٢٣ – ڕ/ن – کافیتیریای زانکۆ:

(( تایەرو تیرۆژ))

تایەر: کوێ بە باشترین شوێنی ئەمشارە ئەزانیت؟ من لەوێ بۆت ئەکڕم باشە؟

تیرۆژ: نا یەکجار واش نا.. خانویەکی ئاسایی لە هەر شوێنێک بێت، ئیتر شوێنەکەش بۆ هەردووکمان ئەبێ دەست بدات.. وەک باوکیشم بکە، چۆن هەموو شتێکی ئەکرد بە ناوی دایکمەوە، تۆش بیکە بە ناوی منەوە.

تایەر: من و تۆ هیچ جیاوازیمان نییە، نامەوێ لە ئێستاوە من من و تۆ تۆ بکەین، باشە گوڵەکەم؟ هەرچیمان هەبێت بۆ هەردووکمانە.

تیرۆژ: دەی من وام پێ باشترە، کە تۆش پێت خۆش بێ بە ناوی هەردووکمانەوە بێ، با وابێ.

تایەر(( پێکەنین)): کچێ من مەبەستم ئەوە نەبوو.. بەڵام باش، هەر لە ڕێوە ئەیکەم بە ناوی هەردووکمانەوە.. خۆ ئیتر هیچ کێشەمان نەماوە، کەس نییە پرسی پێ بکەی؟

تیرۆژ: هەر باوکم ماوە.. خوشک و براو دایکم هەموو ئازادییان داوە بە خۆم و ڕازین.. من دڵنیام باوکیشم دەست ناهێنێتە ڕێمان بە تایبەت لەو شوێنەشدایە، ئەوە هەر هیچ!

تایەر (( دوعا ئەکا)): ئۆهـ خوای گەورە مەڕێکم مەولو بێ ڕزگاری بێ لەو شوێنە.

تیرۆژ: سوپاست ئەکەم تایەر.. من پێم باشە ڕاستیەکەش بە باوکت بڵێی!

تایەر: نا نا بەساقەوبم، بە خوا هەر بزانن لە ژووری سێدارەیە، ڕازی نابن. هەروا باشترە، چووە بۆ سەفەرو گەر لە سێدارەش درا، ئەڵێین لەو ڕێگەیە مرد.

تیرۆژ: نا تایەر، ڕاستیەکەیان پێ بڵێ.. ئیتر ئەوە باوکمەو من حاشای لێ ناکەم، ڕازی نەبن لەوە باشترە دوو ڕۆژیتر پێی بزانن و لەیەکترمان جیا بکەنەوە.

تایەر: ئینجا ئەوسا من چۆن بە قسەیان ئەکەم؟ نەوەڵا فیکرەکەی من باشترە.

تیرۆژ: نا بەقوربان.. تۆ بیڵێ و ئەوسا خانوەکەش بکڕە.. لە ئێستاوە هیچ پارە بە فیڕۆ مەدە، نەک لای ئێوەوە سەرنەگرێ.

تایەر: خەمی لای ئێمەت نەبێ.. باوکم دڵی منی بۆ ناشکێ.. ئینجا گەر بۆی باسکەم چەندم خۆش ئەوێی، ئەوە هەر گڕ ئەگرێ بۆ من. خەمت نەبێ، باشە بە قسەت ئەکەم.

تیرۆژ: دەی ئەوە منیش موحازەرەیەکم لێداو وا ڕێستەکەش تەواو بوو.. دەبڕۆ با موحازەرەیەکی تریش غائیب نەدرێم.. (( هەڵئەسێ)) بەڵام گەر شەویش وەڵامت دەستکەوت، وەرە خەت ئاگادارم بکەرەوە.

تایەر: باشە گیان بەسەرچاو.. لە ئێستێوە وابزانە ڕازی بوون و تەواو.

تیرۆژ: دەی با بزانین چۆن ئەبێ؟!

(( هەستان و ڕۆشتن و خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ٤٢٤ – ڕ/ د – ناو سەیارەی خدرو نارەوەن:

(( خدرو نارەوەن))

خدر: ئەو لە ژووری سێدارەیەو پاسەوانێتییەکەی زۆرترە، کاتێ ئەیبینی توشی شۆک نەبی، هەڵبەت زنجیرو پێوەند کراوەو جلوبەرگی تایبەتیشی لەبەردایە.. خۆت بۆ ئەو بینینە ئامادەکردووە؟

نارەوەن: حەمەخدر، هەریەک لە ئێمە زۆرمان بینیوەو لە تاڵیی و چەرمەسەریی زۆردا ژیاوین، بەڵام ئیتر سروشتی ئێمە ئەوەیە بیرمان بچێتەوە، هەرچەندە من وا ئەزانم مێشکمان بە باشیی تۆماری ئەکا، بەڵام ئێمە بە هەستە ڕۆژانەییەکانمان خۆمانی لێ ئەبوێرین.. بۆیە ئەگەر شتێک ببینم لە دەرەوەی چاوەڕوانی منیشەوە بێت، تۆمارێکیترەو لە دواییشدا خۆم لەویش ئەبوێرم.

خدر: بەڵام بە پێی نزیکیی کەسەکان ئەگۆڕێت.. ڕەنگە نزیکایەتیی تۆو دارەوان وا بکات، توشی هەمان شۆکی تەقەلێکردنەکە ببیتەوە.. یان ڕەنگە دارەوان کاردانەوەیەکی جیاوازی هەبێت لەگەڵتا.. مەرج نییە ئەو پێشوازیت بکا، ڕەنگە قسەی ناخۆش بکا.. ئەوسا ئەکەویتە بەینی دوو حاڵەتەوە.. یان ئەوەتا بۆ تا هەتایە بە دڵشکاویی و کۆستکەوتەیی جێت ئەهێڵێ.. یان تاهەتایە پەشیمان ئەبیتەوە لەم سەردانەت و هەرگیز بیرت ناچێتەوە.

نارەوەن: من خۆم بۆ ئەوەش ئامادەکردووە، کە سەردانییەکە ڕەت بکاتەوەو هەر نەشیەوێ بمبینێ.. لە هەر سێ حاڵەتەکەیا تازە من بووم بەژێر باری خەمێکی گەورەوە.. هیچ پێت سەیر نەبێت گۆڕانکاریی زۆرم بەسەرا بێنێ.. هیچ دەسەڵاتێکیشم نییەو بە نەهاتنم چارەنوسم خراپ ئەشێوا، ئەو کاتە بۆی هەبوو بیرم لە خۆکوشتنیش بکردایەتەوە.

خدر(( ئاهـ هەڵکێشان)): کەوابێ ئەم سەردانیی کردنە لە جێی خۆیا نەبوو.

نارەوەن: بە دڵنیایی.. ئیتر ئەوە قەدەرەو نازانم بەرەو کوێم ئەبا.

خدر: هەرچەند من ئەمەوێ ئەقڵیەتی تۆ بگۆڕم، بەجۆرێک ئەوە بزانی کە خۆت ئەتوانی ڕووداوەکان دیاریی بکەیت و ڕەنگی بۆ بڕێژیت.. کەچی هەر خۆت بە قەدەرا هەڵئەواسیتەوە.

نارەوەن: ئێ وایە کاکە گیان، ئەوەتا بە هەردووکمان لە بەینی سێ حاڵەتا خول ئەخۆین، نازانین کابرا چی ئەڵێ و چی ئەکا، تا ئێمە بزانین چ هەستێکمان لا دروست ئەکا.

خدر: نارە خان زۆر گرنگە کە ئێستا ئەزانی لە نێوان سێ حاڵەتدا خول ئەخۆیت.. من دڵنیام کاردانەوەی هەرسێکیشت لایە.. خراپترین چاوەڕوانیی ئەوەیە بتلاوێنێ و هەستی هەڵەکردن و پەشیمانیی لای تۆ دروست بکا.. بەڵام ئەبێ ئەوەشت لەبیر بێ، ئەو کابرایە زۆرزان و ساختەچیی و بکوژو پڕ فرتوفێڵە.. ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی یاریت پێ بکا.. بۆ نمونە بە نامەیەک تۆی وروژاندو وایکرد بچیت بۆ لای، داخۆ چیترت پێ بکاو چۆن ژیانت لێ تاڵ بکا بە زمانە لوسەکەی؟

نارەوەن: ئەوەش ڕاستە.. بەڵام دارەوان لە پشتی منەوە کێوێکی گەورە بوو ئیتر نامێنێ.

خدر (( خەندە )): منیش هەوڵ ئەدەم ببمە گردێکی بچکۆلەو لە پشتت بم.

(( نارەوەن پێکەنین و ئەکێشێ بە باڵیا ))

Cut

دیمەنی – ٤٢٥ – ڕ/ د – پیشانگەی گەورەی مۆبایلی ڕێژوان:

(( سەلوا جامی دەرەوەی دوکان پاک ئەکاتەوەو ڕێژوان لە دوکانەکەدایە، پاش کەمێک بروسک بە سەیارەکەیەوە دێت و چیمەنی لەگەڵەو دائەبەزن.. دوای سڵاو))

بروسک (( لەناو دەرگای دوکانەکەوە)): ڕێژوان گیان تۆ دێیت؟

ڕێژوان (( بەدەم قسەوە دێتە دەرەوە)): نەوەڵا من هەفتەی پشوو سەرم لێدا، لە دوکان بم باشترە، بەس بوەستە بابچم خواردنێکی بۆ بێنم.

چیمەن: زۆر حەزی لە کفتەیە.. حازرم کردووە، بەشی ١٠ کەسیش ئەکا.

ڕیژوان: ئەڵێن لەوێ سەردەستەو شتی وایان هەیە، با منیش شتێ بێنم، نەک سەردەستەکە کفتەکە بخوا.

سەلوا: ئەیرۆ سەردەستە چییە؟ لە زیندانیشا لە کۆڵیان نابنەوە؟

# (( ئەڵقەی بیست و یەک))

بروسک: وەڵا هەر بیریشم نەبوو، ڕاستە.. باشە دوو سێ نەفەر کەباب و گۆشتیش ئەبەین.

چیمەن: توخوا سەردەستە چییە؟

ڕێژوان: ئای!! وەک فلیمە میسرییەکان لە زیندانا عومدەو موعەلیم هەیە، هەروەک دەرەوەش خەڵک هەیە ببێ بە پیاویان.

چیمەن: ئای خوایە گیان.. باشە بروسک دوو قاپی سەفەریم بۆ بێنە، ئەیکەم بە دوو بەش، دووانیان بە جیا دائەنێم نەک هەمووی زەوتکەن.

(( هەندێ دایالۆگ و ڕێژوان و بروسک ئەڕۆن ))

Cut

دیمەنی – ٤٢٦– ڕ/ن - ژووری ڕائید کۆژین:

(( کۆژین و ڕاهۆز))

کۆژین: بەڵێ ئاگادارم زۆر تێکەڵن.

ڕاهۆز: جگە لەوەش گەورەم سەردانیی کردنی نارەوەن بۆ لای دارەوان کە ئێستا گەیشتوونەتە ئەوێ وەک بەڕێوەبەری زیندان وتی، باش ناکەوێتەوە، بە تایبەت دوای تەڵاق وەرگرتنی.

کۆژین: نارەوەن لەگەڵ ئێمە ڕاستگۆیە، خدریش چالاکە.

ڕاهۆز: بەڵام گەورەم هەردووکیان پێکەوە چوون بە بێ ئەوەی ڕاوێژ بە ئێمە بکەن.

کۆژین: دارەوان ئەقڵێکی سەیری پیلانگێڕیی هەیە.. لەو بڕوایەدام ئەتوانێ کاریان تێ بکا.. تەنها ئەوە جێی مەترسییە.. هەڵبەت بۆ مەبەستێکی تایبەتە، دواتر ئەپرسین.

ڕاهۆز: ئەی فەرمانت بە چییە گەورەم؟

کۆژین: با لەگەڵ بەڕێوەبەر دیراسەی بکەین، پێت ئەڵێم چی بکەیت.

Cut

دیمەنی – ٤٢٧ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی گێلاسی کۆن، بەرامبەر ماڵی دارەوان:

Mute

(( کۆمەڵێک وەستاون نزیکەی شەش کەس و موزایەدەی خانووەکە ئەکرێت و ئاکۆ زوو زوو دەست بەرز ئەکاتەوەو لە کۆتاییدا بۆ ئەو دەرئەچێ.. گێلاس لە دەرەوە وەستاوە.. خەڵکەکە ئەڕۆن و گێلاس ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٢٨ – ڕ/ن – دوکانی لەنگەی شاموراد:

Mute

(( دوکانێک پڕ لە جلی کۆنە.. شاموراد وەستاوەو شاخەو ئیدریس جلوبەرگ هەڵئەواسن و هەندێک بوکەڵەی بێ جلی تر ئەهێننە دوکانەکەوەو جلیان لەبەر ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٤٢٩ – ڕ/ن – زیندان:

(( نارەوەن لە ژوورێکدا چاوەڕوانەو دوو پاسەوان دارەوان ئەهێننە ژوورەوە، هەردوو باڵیان گرتووە.. دارەوان دەست و قاچی بە زنجیرو پێوەند بەسراوەتەوە، بەو جۆرەی باوە لە زیندان))

دارەوان: نارەوەن گیان هاتی؟

نارەوەن: پێویست بوو بێم.

دارەوان: پێم خۆش بوو تەڵاقەکەت وەرگرت و هیچ لاریم نەبوو.. تێگەیشتم ویستت مارەییەکە نەفەوتێ، ئاقڵێت کرد.. گوزەرانتان چۆنە؟

نارەوەن: خەمی هیچت نەبێ.. تەواوی کۆمپانیاکەی زوبێرو وەکالەتەکەم لە منالەکانی زوبێر کڕیەوە، بە نرخی هەرزان، وەک سزایەک بۆ هەوڵی کوشتنی تریفە.. داهاتی زۆر باشە ئێستا.. بەڵام تۆ زۆر خراپەت لەگەڵ ئێمەیا کرد.. گەر پێشتر بتوتایە من خەریکی کاریکی وام، فریات کەوتبووم.

دارەوان(( پێکەنینی کەم)): بە کەس ڕانەئەگیرام نارەوەن..

نارەوەن: ئەو نامەیەت بۆچی نارد؟

دارەوان: پێویست بوو بتبینم.. ئەمزانی ئەگەیتە لام.. کە گەڕایتەوە منالەکانیشم بۆ بنێرە، ڕەنگە دوا بینینتان بێ.

نارەوەن: ئاخر چۆن دەستت چووە خوێنی خەڵک؟ سروشتی تۆ زۆر نەرم و نیانە.

دارەوان: نا بە هەڵە تێگەیشتووی.. من نەرم نەبووم، تەنانەت لەگەڵ تۆشدا.. بەڵام ئەوەم پێ نیشان ئەدای کە نەرمم.. ئەمان لەسەر دوو کەس سزایان داوم کە تازەکیی کوشتوومن.. من زۆر زۆرم لەو ژمارەیە زیاتر کوشتووە نارەوەن.. ئەمزانی هەر ئەگەمە سزادان، لەبەرئەوە هەموو شتێکی ڕەسمیم بە ناوی تۆوە تۆمار کرد.. بەڵام لەوەشدا هەر غەدرم لێکردی.. من پارەیەکی زۆر زۆر زیاتریشم لەوە لێ شاردبوویتەوە، گەر

کەمێک هۆشمەند بوومایە، ئەبووایە بەلانی کەمەوە نیوەی شاراوەکانم بۆ بدایتایە بە موڵک بە ناوی تۆوە.. نەک حکومەت دەستی بەسەرا بگرێ.

نارەوەن: تۆ چ کاتێ یەکەمین کەست کوشتووە؟

دارەوان: پێش ئەوەی تۆ بهێنم.. لێکۆڵینەوە تەواو بووە، تۆ تازەی مەکەرەوە.. ئاگات لە خۆت و لە مناڵەکان بێ.. پشتی یەکتر بگرن.

نارەوەن: تیرۆژیش خوازبێنیی هاتووە.

دارەوان: گەر ماڵێکی باشن با ئەویش بەڕێی خۆیەوە بچێ.. تۆش دایکێکی میهرەبان بەو بێ دڵییان مەکە، خۆت وریای، پێویستیت بە ئامۆژگاریی من نییە.

پاسەوان: کاتتان تەواو.

(( دارەوان هەڵئەسێننە سەرپێ و نارەوەن هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە ئەگرێت و ئەگری))

دارەوان: ئاگات لە خۆتان بێ.. ئامانەتیی تۆو مناڵەکان.. گەردنت ئازاد بێ نارەوەن، تۆ گەردنم ئازا مەکە، شتی زۆر خراپم بەرامبەر کردووی، ڕۆژێک دادێ ئەیزانی.

نارەوەن: پێم بڵێ وەک چی؟

(( پاسەوانەکان دارەوان ئەبەنە دەرەوە))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٤٣٠ – ش/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( هەڵشۆو تریفە لە جێی کاشێر، جاروبار پارەدان هەیە))

هەڵشۆ: من بە هیچ جۆرێک لەو خدرە دڵنیا نیم، هەر بە سیاسەت و زۆڵێتیی دەست بەسەر هەموو پارەکانی دایکتا ئەگرێ.. جا وەک پارەکانی هەر تیائەچێ تیائەچێ، بۆ خۆمان بێ باشترە.. ئەبێ قەناعەت بەوە بکا، من بکاتە بەردەست و شەریکی خۆی.

تریفە: ئەرێ نەبڕایەوە خدر خدر؟.

هەڵشۆ: تۆ چوویت بۆ لای؟

تریفە: بەڵێ چووم.

هەڵشۆ: عەننابییە، دەی.

تریفە: بەڵێ چووم و هەر خەریک بوو سەگیشم پێوەنێ، خۆم پێموتی.. ئەمزانی ئەوە مەحاڵەو هەرگیزاو هەرگیز تۆ لە خۆی نزیک ناکاتەوە.. ئیتر ئەبێ مانای چییە؟ خۆ بە زۆر نابێ؟!

هەڵشۆ: تریفە گیان خوانەخواست ئاخر دایکت شتێکی بەسەر بێ......

تریفە(( هەڵوێستەو قسەی پێ ئەبڕێ)): قەت خوا ئەوە نەکا، چییە چاوت لەدوای مردنیەتی گوێی شەیتان کەڕ بێ؟!

هەڵشۆ: نا ترێ گیان مەرج نییە ئێستا، خۆ ئیتر ژیانەو هەر بە مەرگیش کۆتایی دێت، مەبەستی قسەم ئەوەیە ئەوکاتە ئێمە یەک لەسەر شەشمان بەرئەکەوێ لە میراتییەکەی.. ئەی چۆن؟ دووبراو خوشکێکت هەیە.

تریفە: بەخوا جوانە، یەعنی حسابی تەواویشت بۆ میراتییەکەشی کردووە؟

هەڵشۆ: گیانەکەم ئەبێ ورد حسابی خۆمان بکەین.. بەڵام ئەگەر من بچمە بەردەستیەوە، ئەوکاتە زۆرێکی ئەگۆڕین بۆ سەر ناوی من و زیاترمان بەرئەکەوێ لە میراتیی.

تریفە(( تورە )): ئەوە تۆ تێکچوویت؟ سەری لێداویت چی؟ مردنی چی و میراتیی چی و لێکێشانەوەی چی؟ تۆ بە نیازی چیت؟ پێم بڵێ هەڵشۆ!

هەڵشۆ (( بەخۆدا شکانەوە)): وەڵا هیچ هەر خەممە ئەو هەتیوە دزیی لێ بکات و قۆڵی ببڕێ.. ئەگینا من عیلاقەم چییە بەسەرەوە، کەیفی خۆیەتی.

(( نەفەرێک دێت و تریفە پارەی لێوەرئەگرێ))

Cut

دیمەنی – ٤٣١ – ش/ن – حەوشەی ماڵە کۆنەکەی گێلاس/ خانووەکە چۆڵە:

(( گێلاس و ئاکۆو دیاری))

دیار: حەماڵی بۆ بگرن، بەخوا من دەست نادەمە ڕەش و سپییەوە. نەوەڵا.

ئاکۆ: ناهەقت نییە، جاری پێشوو هەموو مردین بەدەستیەوە.

گێلاس: کاکە کەستان هەقتان بەسەر هیچەوە نەبێ، بچن بەلای کارو پیاسەی خۆتانەوە.. دەبزانن بە یەک ڕۆژ پرپۆڵێک ئەمێنێتەوە نەهێنرابێ؟

ئاکۆ: وا نابێ ژنەکە وانا.. بەیانی من ئەچم دوو سێ حەماڵ ئەهێنم و بەیەکەوە پێیان ئەڵێین چی بکەن و چی نەکەن.. خۆمانی بەدیارەوە نەبین هەموو شتەکان لەتوپەت ئەبن.

دیار: دەی باشە منیش لێرە ئەبم و سەرپەرشتییان ئەکەم.. بەخوا پشتم ئەیەشێ ناتوانم دەست بدەمە هیچ شتێک.

گێلاس: ئای! ئاخر کە پێتان ئەڵێم ئەو دوو گۆڵییە سەقەتە مەکەن، گاڵتەم پێ ئەکەن.. دە تۆ بزانە کوڕێکی گەنج هەیە پشتی نەیەشێت؟

دیار: کچێ دایکە دووگۆڵیی لەکوێ و پشت ئێشە لە کوێ؟ ئەسڵەن ئەوە وەرزشە هەر زۆر باشە بۆ لەش.

ئاکۆ: نا نا دیار گیان زۆر پێی لێ دامەگرە، هەموو ڕاهێنانێکی سەقەت خراپ کار ئەکاتە سەر لەش.. لە هەموو ئەم شارەیا ئەگەر چوار پێنج ڕاهێنەری ئەکادیمیی تیابێ، کەچی هەر کۆڵانەو دە تیپی تیایە، کەواتە ڕاهێنان و جوڵەتان حەتمەن سەقەتە.

دیار: باشە با قسەی ئێوەبێ.. من سبەی لێرەم.

(( دایالۆگیتر))

Cut

دیمەنی – ٤٣٢ – ش/ن – دوکانی لەنگە:

(( شامورادو ئدریس و شاخە))

ئدریس: جا گەورەم ئەمرت بە چییە ئێمە ئەوە بکەین!

شاموراد: ئەوە فەرمانی پاشایە، ناکرێ دواکەوێ.

شاخە: حەز ئەکەی سەری لە لاشەی جیائەکەینەوە.

شاموراد: نا کوشتن نا.. تەنها دەعمێک و هیچیتر، لەسەریشی مەوەستن، لە تەنیشتەوە خۆتانی لێ بدەن و جێی بێڵن.

شاخە: بەیانی جێبەجێکراوە، گەورەم.

ئدریس: جەنابت ئەچیتەوە بۆماڵەوە؟

شاموراد: نا.. ئەچمەوە خانووەکەی تر، لەگەڵما وەرن.. درەنگانیش تا نزیکی ماڵەوەم بگەیەنن.

شاخە: فەرموو گەورەم.

شاموراد: ئا ئدریس.

ئدریس: بەڵێ گەورەم.

شاموراد: لە بەیانییەوە، نەهێڵن هیچ کەسێک لە سنوری دوکانا هیچ دابنێ و بەچە ترسێنێکی دەرودراوسێش بکەن، بەڵام شتی نایاسایی نا.

شاخە: گەورەم هەر دەنگ بەسەرا بەرزکردنەوەو کەمێک چاوسوور کردنەوە.

شاموراد: ئێهـ ئیشی خۆتان باش ئەزانن.

(( چوونە دەرەوەو دەرگا داخستن))

Cut

دیمەنی – ٤٣٣ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی تایەر:

(( تایەر بە جلی ماڵەوە، باوکی و زایەر، هەردووکیان بە جلی قەسابییەوەو کێردو قەمەیان لەبەرپشتایە، بە پێوە وەستاون))

زایەر: کە باوکم قسەیەکی کرد فێری ئوسوڵ بە، هەر ئەوەیەو گەڕانەوەی نییە، ئەگینا بەخوا بەخوا ئەم کێردە لە سکت ڕائەیەم.

باوک: وازی لێ بێنە زایەر گیان دیارە پیس لە خشتەی بردووە، داوای پارەی خانووشمان لێ ئەکا بۆی بکڕین.

تایەر: دەی بەخوا بەخوا باوکە ئەو تیرۆژەم بۆ نەهێنن، چاوتان بە من ناکەوێتەوە، یا خۆم ئەکوژم، یا سەری خۆم هەڵئەگرم. (( تایەر زللەیەک لە پشتە ملی ئەدا)) بمکوژن.. بۆ نامکوژن.

باوک: مەکە زایەر.. تایەر گیان بچۆ کچێکیتر بدۆزەرەوە باوەگیان.. وەعد لە شەو و ڕۆژێکا هەموو شتێکت بۆ تەواوکەم.. بەڵام ئەو ماڵە زۆر دەوڵەمەندو بە نازو بازن.. ئێمە لەگەڵ ئەوانا هیچمان پێ ناکرێ و هەر ناشتوانین بیگوزەرێنین..

تایەر: بەخوا وانییە باوەگیان.. ماڵێکی زۆر سادەو باشن.. بە دەوڵەمەندیی و خۆدەرخستنەکەیانا تێمەکەوە.

زایەر: نییە یەعنی نییە.

باوک: کوڕم لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوەو گوێ بگرەو تێ بگە! فەرقی ئێمەو ئەوان ئاسمان و ڕێسمانە.

تایەر: دەوەڵاهی هەر ئەوم ئەوێ.

باوک(( بەدەم چوونە دەرەوەوە)): دەی هەردوو چاوت دەرئەهات.

(( باوک و زایەر ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٣٤ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر، ژوورەکەی زوبێر:

(( خدرو نارەوەن دانیشتوون.. نارەوەن تەماشای پاسپۆرتەکەی ئەکا ))

نارەوەن: کەواتە لە ئێستەوە ڕێ پێدراوین بۆ سەفەر کردن؟

خدر: بەڵێ، هەرکات ئەمرت فەرموو دەرئەچین.

نارەوەن: زۆر جەنجاڵم.. نە تاقەتی بیرکردنەوەم ماوە، نە تواناکەشی.. حەز ئەکەم کەمێک لەم ژاوە ژاوە دوور بکەومەوە.

خدر: تۆ هەموو شتەکان بە من بسپێرەو بە قسەم بکە، هەمووی ئەهێنینەوە سەر ڕاستە.. بەس بە قسەم بکەو هیچیتر.

نارەوەن: جا چیم بە قسە نەکردووی؟

خدر(( نامەیەک دەرئەهێنێ )): ئەم نامەیەی بۆ بنێرەو بۆ سەفەرەکەش پێی بڵێ.

نارەوەن (( خەندە )): چۆن ئەتوانم پێی نەڵێم هەهە، ئەزانی چی پێکردم لەسەر چوونەکەی لای دارەوان؟ هەر تۆ ئاقڵ بووی نەهاتیە ژوورەوە.. ئەگینا سزای گەورەتریش ئەدرام و ئەوسا بە تۆشەوە.

خدر: ئاخر بۆیە ئەڵێم بە قسەم بکە.

نارەوەن: دەی باشە.. ئەوە بە قسەم کردی... ئێستا چی بکەین؟

خدر: پێش سەفەرەکە، یان نامەیەک بۆ زوبێر بنوسە، یان بچۆ بۆ لای و لێی خۆشبە.

نارەوەن(( تورە )): ئەوە تۆ تەواویی؟ لێخۆشبوون لە بکوژی کچەکەم؟ هەر بێتە دەرەوە ئەمجارەیان وا ئەکا کەس نەزانێ و ڕەنگە خراپتریش بکا.

خدر: نا نا وا بیرمەکەرەوە.. ئەو کابرایە زیندان و سزای بینی.. جارێکیتر بیر لە تاوان ناکاتەوە هەرگیز.. دوای ئەوە تۆ لێیخۆش بیت و نەبی، خۆ ئەو بەرنابێ.. تازە بڕیاری دادگا دراوە.. ئەگەر لە دادگاش لێی خۆش بی، ئەوپەڕی کەمێک سزاکەی سوک ئەبێ.

نارەوەن: نا حەمەخدر توخوا ئەوەم پێ مەکە.. بەخوا چاوم بەرایی نادا هەر بشیبینم.

خدر: نا.. ئێستا ئەم بیرۆکەیەت لا دروست بوو بۆیە توندی.. بیری لێ بکەرەوە بە هێمنیی، ڕەنگە بڕیارت بگۆڕی.. من دەمێکە پێت ئەڵێم دڵت پاک بێتەوە، ئەوکاتە بە ئاسانییش ئەتوانی لە دادگا لێی خۆش بی.

نارەوەن: بۆ لێی خۆش بم.. سوودی چییە بۆ من؟ ئەوەی بیری لێ نەکەمەوە لەم کاتەیا زوبێرە.

خدر: ئەوە ڕاستە، بەڵام بەخۆت بزانی و نەزانی، ناڕاستەوخۆ ویژدانت ئازارت ئەدا، کە لە شوێنەکەی دانیشتووی.. لەبەر تۆ ماڵیان گواستەوەو نیمچە سەرگەردان بوون.. ئێستا خەریکی کەسابەتی بازاڕن، من ئەزانم تۆ ئەوە نییت نەبینی لە کوێوە دابەزیون بۆ کوێ؟!

نارەوەن: هیچ شتێکم نەسەپاندووە بەسەریانا.. خۆیان ئەوەیان پێخۆش بوو.

خدر: بەڵام لە شەرمندەیی خۆیانا ئەوەیان کرد.. بە هەرحاڵ، دیارە بە قسەم ناکەی، کێشە نییە، ئیتر هیچیتر ناڵێم.

نارەوەن: دەی تۆش ئەوەندەیتر بە دڵە ناسکەکەت وێرانم مەکە.. بەرگەی ئەو هەموو شتە ناگرم ئینجا تۆش سەربار بیت.

خدر: دڵناسکیی نییە نارەخان، بەڵێننامەیە، تۆ بە قسەم بکەو منیش خزمەتت بکەم.

نارەوەن: تاقەتی بیرکردنەوەی ڕۆژم نەماوە هههە، با شەو بیری لێ بکەمەوە، سبەی باسی ئەکەینەوە.. ئەی پێت باشە کەی بڕۆین؟

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤٣٥ – ڕ/ د – چایخانەی نوێی هاوڕێ/ تەنیشتی ئۆفیسی وەکالەت:

(( لەبەر چایخانەکەدا کورسی درێژ و تاک هەیە، وجاغێک لە دەرەوەیەو جێگیر کراوە.. دوکان نییە.. ئەکرێ شوێنەکە بچوک یان هەر جۆرێک بێت.. مشتەری گەنجیش هەیە وەک تەلەبەو کاسب لە دەرەوە دانیشتون و دوای چا ئەکەن.. هاوڕێ گورج و گۆڵانە چا تێ ئەکا.. پاش کەمێک ئەردەڵان بە لۆژەلۆژ دێت و بێدەنگ دائەنیشێت، دواتر هاوڕێ دێتە بەردەمی))

هاوڕێ: ئەوە بۆوا لوتت داژەنیوە؟ خێر؟

ئەردەڵان: خدری سەگباب دیسان؟

هاوڕێ: ئۆوهۆ دیسان کاک حەمە خدر؟ هەر ڕزگارت نەبووە لە دەستی؟ خۆ باری تۆی بارنەکردووە؟ هههە

ئەردەڵان: کورە ئێستا زمانی لار ئەکاتەوە کە قسە ئەکا، گوایە ناسکە، باری چی؟ ئەو خوێڕییە بارێکی گەورەی لەولا بۆ داناوم باریکەم.

هاوڕێ: جا تۆ وەرە (( ئاماژەی ئەردەڵان ئەکا )) ئەم کەرە لەم قوڕاوە دەربێنە.. ئیشی ئەداتێ هەر وەی، نایداتێ هەر وەی.. دەی پێم بڵێ چۆن لەگەڵتا پێک بێت؟ تا پێی؟بڵێم ئەوەت لەگەڵ بکا.. درەنگمە دەی خەڵک داوای شت ئەکەن.

ئەردەڵان: تۆش بچۆ بەلای ئیشتەوە.. ئەو ناپیاوە ئەگەر ڕاست ئەکا، با هەر باری ئێرەم بداتێ، من تاقەتی ئەوێم نەماوە، زۆر دوورو چۆڵە.

هاوڕێ: ئای خوا هاوار.. دانیشە ئێستا ئەحەو کارەی بۆ ئەنێرم، ئەو نەیداوە بە برازاکانی لەبەر تۆ، تۆش جنێوی پێ ئەدەی.

ئەردەڵان: نا کاکە برازای خۆی بۆ ئیشی ئێرە داناوە.

هاوڕێ (( ئەیەوێ بڕوا )): دە کەیفی خۆتە، هیچ ئەخۆی؟

ئەردەڵان(( هەڵئەسێ)): نا ئەچم بۆ بارەکە، پێیان مەڵێ، خۆ لەدەستیان دێ ئەویش بار بکەن.

(( ئەردەڵان ئەڕواو هاوڕێ گاڵتەی پێدێت))

Cut

دیمەنی – ٤٣٦ –ڕ/ن – نەخۆشخانە:

(( ئاکۆ دەستی بە ملییەوە هەڵواسراوەو شکاوە، گێلاس و دیارو سۆمای ٣٥ساڵی کچی بە دیاریەوەن))

ئاکۆ: هەروەک ئاگری قودرەت لێم نازڵ بوو.. لای خۆمی گرت و ئەوەی هەستم پێکرد نەیانتوانی کۆنترۆڵی خۆیان بکەن و خۆیان پیا کێشام.. دوو گەنجی سەرەڕۆ دیار بوون، نەشوەستان و بۆی دەرچوون.

سۆما: بەخوا باوکە گیان خێرێکمان لەسەرە بەوە ڕزگارت بوو.

دیار: تۆ شێوەیانت بیر نەماوە؟

گێلاس: کورە هەر نەیبینیون.

ئاکۆ: نەء بەس لەلاوە بینیمن، زۆر بە خێرایی تێیان تەقاند.

دیار: من دڵنیام بە ئەنقەست خۆیان پیا کێشاوی.. سەیارەکەیان چی بوو؟ ئەی ژمارەی؟

ئاکۆ: کوڕم من لە تاوی خۆم ئاگام لە چی بوو.. نەوەڵا هەر نەمزانی سەیارەکەیان چی بوو.

سۆما: با پۆلیسەکان وتیان کەسێک بینیویەتی، سەیارەکە فۆرتێکی مۆدێل کۆن بووەو ژمارەکەشی زۆر کاڵ بووە بۆی نەخوێنراوەتەوە.

ئاکۆ: بەخوا ئیتر من نازانم. بەڵای ناگەهان بوو، هیچیتر.

(( دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤٣٧ – ڕ/ن- پیشانگەی ڕێژوان:

(( ڕێژوان و سەلوا دڵخۆشن، سەلوا بە وردیی قسە ئەگێڕێتەوە))

سەلوا: جا کاکم ئەیوت هەر ئەو سەیارەیە بووە کە تەقەی لە نارەوەن خان و کاک حەمە خدر کردووە.. ئێستا پۆلیس بەدووایانا ئەگەڕێ.

ڕێژوان: یەعنی نارەوەن خانیش باوکمی بینیوە؟ تۆ ئەوەیانم بۆ باسکە.

سەلوا: ئەی چەندجارت بۆ بگێڕمەوە، چووەو دڵیشی داوەتەوە.. باوکت داوای لێکردووە لێیخۆش بێت، ئەویش لە دڵەوە گەردنی ئازاکردووە.

ڕێژوان: کچێ بەساقەوبم سەلوا گیان، خۆشمزدە بی، خۆشترین هەواڵت بۆ هێناومەتەوە، من چی لە ماڵی ئاکۆ بکەم؟ ئەمە هەواڵە.. تۆ ئاگات لە دوکان بێ، من ئەچم بۆ چیمەنی باس ئەکەم، زۆر دڵی پێی خۆش ئەبێ.

سەلوا: باشە بەقوربان، بڕۆو ئاگات لە خۆت بێ، بەس زوو بێیتەوە.

ڕێژوان: خەمت نەبێ هەر نیوسەعاتێک کەمتریش.

(( ڕێژوان بە دڵخۆشیی و پەلە ئەچێتە دەرەوەو سەلواش دائەنیشێ، مشتەری دێت و هەواڵی جۆرە مۆبایلێک ئەپرسێ))

Cut

دیمەنی – ٤٣٨ – ڕ/ د – ڕێی فرۆکەخانە:

(( حەمە خدرو نارەوەن بە جلی جوانەوە بەرەو فرۆکەخانەو دەرچوون.. دەرهێنەر سەربەستە))

_______________ Cut _______________دیمەنی –

دیمەنی – ٤٣٩ - ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( تریفەو تیرۆژ لە جێی کاشێر))

تریفە: ئەی تۆیان بۆ نەبرد؟ لەبەر زانکۆکەت؟

تیرۆژ (( بە خەمساردیی)): بەڵێێێێێ!

تریفە: دەی ئەوە گرنگترە ڕاست ئەکەن، ئەی جوابی کوڕە چی بوو؟

تیرۆژ: پێم وت بێت بۆ ئێرە تۆش ببینی، وتم چەند ڕۆژێک دایکم ئەچی بۆ سەفەر. من هەر لە قاوەخانەی خوشکە گەورەکەم ئەبم لە دوای زانکۆوە، سبەی وەرە لێرە دائەنیشین.. بە ڕاست کاک هەڵشۆ هەر نایەت بۆ ئێرە؟

تریفە (( گاڵتەپێکردن)): هەهە هەڵشۆ!!!! ئەگەر ئیشی پێم نەبێ نەوەڵا شەواو شەو دەرەنگانێ ئەیبینم، ڕۆڵە خۆ من ژنی مێردداار نیم، من بێوەژنێکی مێرددارم.

تیرۆژ: دیارە ئەویش سەرقاڵی ئیشێکیترە.

تریفە: وەڵا مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ چی ئەکا؟! پێم بڵێ کوڕەکە ئێرە ئەزانێ؟

تیرۆژ: ئا ئا، ئێستا ئەو هێنامی بۆ ئێرە.

تریفە: دەی با ببینین، بزانین نمووی چۆنە؟!

تیرۆژ: ڕاستت بوێ هاوشانی ئێمە نیین.. بەڵام هەست ئەکەم هێزیان هەیە، خزم و قەومی زۆر بە دەوریانەوەن، جگە لەوەش هەبووون. تواناایان باشە.. ئەو دوو هۆکارە وای لێکردووم ڕازی بم.. بە تایبەت هێزی خزمانیان.. تۆ ئەوە بزانە ئێمە کەسمان بە دەورەوە نەماوە، ئەگەر یەکێکمان شتێکمان بەسەر بێ، کەس نییە بەرگریمان لێبکا.

تریفە: توخوا ئەوە قسەیە تۆ ئەیکەی تیرۆژ؟ یەعنی خۆشت ناوێ و لەبەر هێزو پارە شووی پێ ئەکەی؟ توخوا مناڵیش شتی وا ئەکا؟ دەی دڵنیابە نەمهێشتووەو ناهێڵم شووی پێ بکەی.. دوای ئەوە تۆ کەی پەکت لەسەر پارە کەوتووە؟

تیرۆژ: پەکم نەکەوتووە تریێ گیان، بەڵام سەیری تۆ ئەکەم، ئەگەر باوکم ئەمەی بۆ دانەنایتایە، ئێستا پەکت کەوتبوو.. قەینا باوکم مەرامی خۆی هەبوو لە پشتی ئێوەوە، بەڵام فریاشتان کەوت.. ئەی من شوو بکەم بە لات و پاتێ باشە؟

تریفە: بەڵێ ئەوە باشترە گەر خۆشت بوێ.. ئێستا لاتوپاتە دوو ڕۆژیتر گەر یەکتان خۆش بوێ ئەتوانن شتی زۆر پێکەوە بنێن.. ئەم قسانە کێ فێری کردووی، کوا لە خێزانی ئێمەدا بەرژەوەندیی هەبووە؟

تیرۆژ: دەی من شوویەکی ئاوام ئەوێ.. بەڵێ هەموو شتێ بەرژەوەندییە لە ئێستادا.. کێ بەبێ بەرامبەر بەردێک ئەداتە دەستەوە سەری خۆتی پێ بشکێنی؟ تەنانەت باوکەکەی خۆت بۆ بازرگانی تلیاک نەبووایە ئێرەی بۆ نەئەکردیتەوە خوشک گیان.

تریفە: ئای ئای ئای، لەم بیرکردنەوە سەقەت و پڕ مەترسییە.. دەبا پێت بڵێم، تۆ بەو جۆرە بیربکەیتەوە، کابرای مێردیشت هەر بەوجۆرە بیرت لێ ئەکاتەوە.. دڵنیا بە کە بەرژەوەندیی نەما یان چاوی لێت تێر بوو، بە نوکەشەقێ ئەتکاتە دەرەوە.

تیرۆژ: جا با بمکاتە دەرەوە.. من هەر لەڕێوە نیوەی خانوەکەم پێ خستۆتە سەر خۆم کە کڕی. مارەییەکی قورسیش دائەنێم و ئاڵتونی زۆریش.. کە کرامە دەرەوە، من خاوەن سەرمایە ئەبم، گیانی من.

تریفە: وەیش کە داماوی؟! کیسەت بۆ مارەیی هەڵدووریوە تیرۆژ گیان؟ یان نیوە خانوو و نازانم ئاڵتون و ماڵتون؟ ڕۆڵە ئەوانە ئەبڕێتەوە، بەڵام خۆشەویستی لە پێش هەموو ئەوانەوەیە.. ئەم قسانەت بۆ دایکیشم کردووە؟

تیرۆژ: نا نا توخوا با دایکم نەزانێ حەیام ئەبا.. دەرەقەتی دەمی ئەو نایەم.

تریفە: دەی سا بەخوا ئەو هەتیوە بێتە پێشەوەو تۆ ڕازی بیت، هەموو نیەتە خراپەکانتی بۆ باس ئەکەم.

تیرۆژ: ئۆوهووو ئینجا نۆرەی تۆمە (( تورە ئەبێت و هەڵئەسێ ئەڕوا بۆ سەر مێزێک))

Cut

دیمەنی – ٤٤٠ – ڕ/ن - دوکانی لەنگەی شاموراد:

(( شاموراد بە مۆبایل قسە ئەکاو سڵ ئەکات و سازشی زۆر، ئدریس و شاخە کەمێک لێی دوورن.. جلوبەرگی کوردی نایاب و کڵاشی هەورامیی و پۆز لێدانیان هەیە))

شاموراد: بەڵێ پاشا گیان جێبەجێکراو هەمان سەیارەش بەکارهات.......... سەرچاو، نا خەمت نەبێ بە ناوی کەسەوە تۆمارنییە، دزراوە، ژمارەکەشی ساختەیە.......... باشە بەسەرچاو وای لێئەکەین هەر ئەمشەو............. بەڵێ هەرکاتێک پێویستمان بوو پرس بە جەنابت ئەکەین و دزراوێکیتر ئەکڕین.......... زۆر سوپاس، قوربانتم پاشا گیان........... مەمنونینماڵت ئاوا بێ....... خوات لەگەڵ خواحافیز.

شاموراد: شاخە، وەرنە ئێرە. (( شاخەو ئیدریس بە پەلە دێن))

شاخە: ئەمرکە گەورەم؟!

شاموراد: ئەمشەو ئەو سەیارەیە ببەن و لە شوێنێک بیسوتێنن.. ئیتر کارمان پێی نەماوە.

ئدریس: فەرمانتە گەورەم، هیچ ئاسەوارێکی خۆمانی پێوە ناهێڵین.

شاموراد: بەڵام بە وریایی!

شاخە: هیچ خەمت نەبێ گەورەم.

شاموراد: ئەی شاخە ئەو کابرایەی باستکرد، نایەت دەست بەکاربێ؟

شاخە: گەورەم لەگەڵ باوکی ئیشی قەسابیی و جەڵەبچێتیی ئەکەن.. وا بە نیازە لە باوکی جیاببێتەوەو بێتە لای خۆمان.

شاموراد: کەمێک پەلەی لێ بکەن، ئیشی گەورەترمان بەدەستەوەیە.. چوارکەسمان پێویست ئەبێ.

ئدریس: منیش کەسێک شک ئەبەم گەورەم. دەی ئەگەر هات ئەویش بابێ.

(( خەڵک دێت و لە جلوبەرگ ئەڕوانن)) ________ Cut ________

دیمەنی – ٤٤١ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن دێتەوەو تەنها تافان لە ماڵە))

هەندرێن: تافان تافان (( تافان لە مطبخ دێتە دەرەوەو بەڵێ ئەکا)) هیچ حازرە بیخۆین؟

تافان: ئەوە بۆ وا بە پەلە؟ پیرێژنەکەت ملی شکاند؟

هەندرێن: ئۆوهۆۆۆۆ دیسان دەستمان پێکردەوە؟! مناڵەکان چوون بۆ مەکتەب؟

تافان: نا.. چاوەڕێی تۆ ئەکەن بیانگۆڕی و ڕەوانەیانکەی. ئەی چۆن نەڕۆشتوون؟

هەندرێن: ئەرێ ئەوە چییە دیسان ژنەکە؟ من ئەپرسم ڕۆشتوون یان نا؟ ئیتر ئەم جۆرە وەڵامە ڕەقە بۆ باوانم؟ بڵێ ڕۆشتوون و تەواو.

تافان: جا کە خۆت ئەزانی ڕۆشتوون ئیتر بۆ ئەپرسی؟

هەندرێن: ئەگەر تا ئێستاش فێری شێوازی وەڵامدانەوە نەبوویت، لاریم نییە کۆرسێکت بۆ بکەمەوە فێرتکەم.

تافان: کۆرس بۆ خۆت بکەرەوە گیانە! با فێر بی کە ژن لە ماڵەوە ماندوو بوو، چۆن سڵاوی لێ بکەیت و بە قسەی خۆش ماندوێتیی بحەسێنیتەوە، نەک هەر لە ڕێوە بێیتەوەو بە شیرە شیرو بە خێرایی داوای نان بکەی، وەک ڕاونرابی.

هەندرێن: ڕاست ئەکەی حەقی خۆتە ببورە.. چیمان هەیە بمدەرێ با بیخۆم و بچمەوە بۆ سەر ئیش، ئەمڕۆ نە کاک حەمەخدرو نە نارەوەن خان لەوێ نیین و ئیشیش زۆرە.

تافان: ساوەری سوورە ئەیخۆی؟

هەندرێن: هەرچییەکە بیهێنەو با بگەڕێمەوە.

تافان(( لالووت)): ئەمرەکەی قوربان!

(( تافان ئەچێت خواردن بهێنێ و هەندرێنیش بۆ دەست شتن)) _____ Cut _____

دیمەنی – ٤٤٢ – ڕ/ د – بەر ماڵی ئاکۆ، بەرامبەری ماڵی دارەوان:

(( گێلاس و دیار، ئاکۆ لە سەیارەی گێلاس دائەگرن، کە دەستی بە ملیا هەڵواسراوە، هەندێک ڕێکخستن بۆ هێنانە ژوورەوەی بەدەم دایالۆگی ئاساییەوە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٤٤٣ – ڕ/ن – متبوع – ماڵی ئاکۆ:

(( ئەکرێت پێش ئەم دیمەنە، هاتنە ژوورەوەشیان وەک دیمەنێک لە حەوشەکەدا نیشان بدرێت پاشان بە تابع و متبوع بێنە ناو ژوورەکە.. گێلاس بە خێرایی ئەڕوا، پەرداخێک ئاو ئەهێنێت و ئەیداتێ))

دیار: خانوویەکی شووم دیارە، خۆ پشوویەکما نەدا ئەمە ڕوویدا!

گێلاس: وەڵا ئەوە چەند ساڵە لەم خانووەداین و هەر خێرو بەرەکەتمان بەسەرا ڕژاوە، دەعمەو خوا خۆی ویستوویەتی لەم کاتەیا ڕووبدا.. ئیتر چ پەیوەندییەکی بە هاتنەوە ناو خانووی کۆنمانەوە هەیە؟

دیار: وەڵا بۆی هەیە.

ئاکۆ(( ئەناڵێنێ)): ئاخ پشتم، بەخوا ئەویش خەریکە ئەتەقێ، خۆ هەر دەستم شەرت نییە.

گێلاس: ئێ وایە کوتراوی ئاکۆ گیان، وەڵا ئەزانم ئێستا هەموو عازای بەدەنت ئەناڵێنێ.

ئاکۆ: ئەرەوەڵا حەوزم ئەڵێی هەر دەرکراوەو دانراوەتەوە.

دیار: ئای مەکینەی سەیارەیە هههە.

گێلاس: وەی قوزەڵقورت، خۆ گاڵتەی پێ دێت.

ئاکۆ: ئەوە با ئازارەکە بە خۆیەوە بێت، ئینجا ئەزانێ چ باسە.

دیار: بەخوا بەینی خۆشمان بێ باوکە، کەمێک لەگەڵ ئازارا بێ تەحەمولی.

ئاکۆ: جا بۆ یەکجاریی ناڵێی بێغیرەتی ڕۆڵە!

گێلاس (( بە سوعبەتەوە پیا ئەکێشێ)): حەددی چییە وا بڵێ.

Cut

دیمەنی – ٤٤٤ –ڕ/ن – میسر/ فرۆکەخانە:

Mute

(( نارەوەن و حەمەخدر لە فرۆکەخانە دائەبەزن، ئامۆو ئاوا لە پێشوازییاندا وەستاون و گوڵیان پێیە.. باوەش بە یەکا کردن و دڵخۆشیی و چوونە دەرەوە لە فرۆکەخانە))

Cut

دیمەنی – ٤٤٥ – ڕ/ن – ماڵی بروسک:

(( سکەکە بە چیمەنەوە دیارە.. بروسکیش دانیشتووە))

بروسک: دەی باشە تۆ بچۆ بۆ ماڵی ڕێژوان.

چیمەن: ئیتر ئەوان بێنە ئێرە یا من بچم، مەسەلەیەک نییە، بەس ئەوان بێن باشترە.

بروسک: وایە ڕاستە، سەلوا بە ڕۆژ لە دوکانە، تۆ هەر ئەبێ خۆت خزمەتی خۆت بکەی، لە ماڵی خۆمان بی باشترە.. زۆریشم پێ ناچێ، سێ یان ئەوپەڕەکەی چوار ڕۆژ.

چیمەن: کورە هەفتەیەکش بۆ تۆ، ئەوە کەی کێشەیە؟

بروسک: ئەگەر ئیشەکە وا بڕوا زۆر ڕوو لە هاتە.. ڕێژوانیش زۆر دڵی پێی خۆشە (( پێکەنین)) ئەیوت من وامزانیوە تەنها ئیشی کۆمپانیا هەیەو ئیتر ئەوانیتر هەموو لە زەرەران، چوزانم وایە.

چیمەن: ئەی ناهەقی نییە داماوە، ئەوەتەی هەیە هەر ئەو ئیشەی کردووە.

بروسک: نا نا ئێستا باش چاوی کراوەتەوە، سەرەتاتکێی ئیشیتر ئەکا، کچێ ئەیوت ئەی بۆ منیش نەیەم بۆ دوبەی لەگەڵتا؟

چیمەن: نا نابێ، ئەگینا ئیتر پیاوێک نامێنێ لە ماڵەکەیا.

بروسک: ئێ.. ئاخر منیش وام وت.

(( دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤٤٦ – ڕ/ن – ماڵی ئاکۆ/گێلاس:

(( ئاکۆ ڕاکشاوە لەسەر قەنەفەیەک و گێلاسیش لەسەر یەکێکیتر دانیشتووە))

ئاکۆ: من دوژمنی چیم هەبێ گێلاس؟.. باوەڕ بکە هەر دەنگە دەنگێکیشم لەگەڵ هیچ بنیادەمێکا نەبووە.. ئیتر بۆ ئەبێ ژیانم لە مەترسیا بێ؟ هیچ تێناگەم، تۆ بڵێی پۆلیس بە هەڵەدا نەبرابێ؟

گێلاس: مادام هەر بەو سەیارەیە تەقە لە نارەوەن و خدریش کراوە.. نەخێر هیچ بەهەڵەبردنێک نییەو مەترسییەکە ڕاستەقینەیە.. ئەگەر ئەوە نەبووایە وەک ڕوداوێکی لابەلا تەماشا ئەکرا، بەڵام ئێستا نا.

ئاکۆ: ئەرێ نارەوەن دیار نەبوو، تۆ بڵێی لێمان عاجز بێ؟

گێلاس: نا لەوەئەچێ کەسیان لە ماڵ نەبن.. هیچ جموجوڵێک لە ماڵەکەیاندا نییە، زۆر دیقەتمدان.. چوزانم لەوانەیە بۆ ئەوەی پرسەی دارەوان نەگێڕن کەسیان نەیەنەوە.

ئاکۆ: بۆ نا؟ ڕەنگە وابێ... من هەر لە بیری ناحەزو خەڵکی خراپام.. تۆ بڵێی نارەوەن ڕاینەسپاردبن ئەو دەعمەم لەگەڵ بکەن؟

گێلاس: ئەیرۆ! نارەوەن بۆ؟

ئاکۆ: ئەی بڵێم چی؟ پێی ناخۆش بێ هاتووینەوە گەڕەک؟

گێلاس: نە بابە نا نارەوەنی داماو بەسەر کۆستی خۆیا کەوتووە، ئاگای لە عەشتەبای خوا نەماوە، هەر باوەڕیش ناکەم بیستبێتی ئەمەت بەسەر هاتووە.. ئەو ڕۆژەی بینیم بەخێرهاتنەوەی کردین و زۆر خۆشحاڵیی دەربڕی، ئیتر لەو ڕۆژەشەوە نەمبینیوەتەوە.

ئاکۆ: نا.. هەر ختورەیەک بوو هیچیتر.

(( ئاکۆ چاو دائەخا وەک سەرخەو بشکێنێ، گێلاسیش ئەچێتە ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ٤٤٧ – ش/ن –ماڵی پاشا:

(( پاشا بێ ئەوەی دەموچاوی نیشان بدرێ، بە دەمامکەوە لەسەرلاو چروتی بە دەستەوەیە ئەیکێشی.. دووانیش لە پشتی شامورادەوە بە دەمامکەوە وەستاون))

پاشا: دەستتان خۆش بێ، خەلیل لە دەرەوە پارەی خۆیان بدەرێ.

خەلیل: بەسەرچاو پاشا گیان.

شامورا: خوا لە کیسەتی بەزیادکا پاشا گیان.

پاشا: ئەو کوڕانە ماڵی نارەوەن ئەزانن.

شامورا: بەڵێ پاشا گیان.

پاشا: سبەی شەو، چالاکییەکی گەورەم لە ماڵی ئەواندا بۆ ئەکەن.

شامورا: فەرمانتە پاشا گیان، هەرچییەکم پێ ڕاسپێریت.

# (( ئەڵقەی بیست و دوو ))

پاشا: دوای دوانزە کوڕەکان بنێرە، هەر پارەو ئاڵتونێکیان دۆزییەوە بیهێنن.. دەرگایەکی داخراو نەهێڵنەوە، هەمووی بشکێنن، نەک پارەی تیابێ.

شامورا: گەورەم ئەی خۆ لە ماڵن؟!

پاشا: ئەوە نازانم.. هەر کەسێکیشیان بینی بیکوژن، ئەبێ ئەم ئیشە زۆر بە نهێنیی بەڕێوە بچێت و نامەوێ هەڵەی تیا بکەن.

شامورا: فەرمانتە پاشا گیان. من نازانم چەند کەسن لە ماڵەیا، بەڵام جەنابت وا بزانە هەموو کوژراون، بێخەمبە.

پاشا: دەی دە بچن بەلای کاری خۆتانەوە.

شامورا: فەرمانی پاشایە.. بەڵام بۆم هەیە پرسیارێک بکەم پاشا گیان؟

پاشا: فەرموو شاموراد.

شاموراد: ئیشی تلیاک بە ئاسانیی دێتە دەست، تاقی نەکەینەوە؟

پاشا: نا خۆتانی لێمەدەن، هەموو ڕێسراوێکمان ئەکاتەوە بە خوری و ئەم ئیشانەشمان لێ تێک ئەدا.. حوکمەت زۆر بە وردی بە شوێنیا ئەگەڕێ.. بیری لێ مەکەرەوە.

شاموراد: فەرمانتە پاشا گیان، سبەی شەو کارەکە جێبەجێکراوە.

پاشا: دەی بە سەرکەوتوویی. (( دوای خواحافیزیی و ڕۆشتنی شاموراد.. پاشا بە مۆبایل تل ئەکا )) گوێ بگرە نەجات، ئەوی ئەڵێم بە وردیی جێبەجێی بکە...... سبەی شەو دوای سەعات ١٢ هەندێ دز ئەچنە سەر ماڵی نارەوەن.. ئەمشەو جوان چاودێریی ماڵەکە بکە، بزانە لە ژێر چاودیریدا نییە؟................ ئەزانم دوێنێ شەویش چاودێریت کرد.. ئەمشەویش تا بەیانی بە ئاگابەو ئەو دەوروبەرە جێ مەهێڵە.. دوای دزییەکەش ئەگەر پۆلیس دەرکەوت تۆ ئەزانی چی ئەکەیت؟

_________________ Cut _________________

دیمەنی – ٤٤٨ – ش/ن – شوقەی ئاواو ئامۆ:

(( لە ژوورێکیان سیسەمی دوو نەفەریی و کورسیی تیایەو ئامۆو ئاواو نارەوەن و خدر دانیشتوون))

نارەوەن(( بۆ ئامۆ)): نا کورم بە هیچ جۆرێک ناگەڕێیتەوە بۆ ئێرە بە گەشت نەبێ.

ئاوا: ئاخر ئیشی ئێرەمان زۆر باشە دایە گیان.

نارەوەن(( بۆ ئاوا)): ئەوە حەمەخدر لێی بپرسە کورم.. قەت ئیشی ئەوێش وا نەبووە.. ئەو تەلەفونەش هەندرێن بوو بە ڤایبەر کردی، ئەڵێ هیچ ڕۆژێک ئاوا ئیش نەباریوە، لەوێ بە چواری وەکو ئێوەش پێ ڕاناگەن.

ئاوا(( بۆ ئامۆ)): دەی دەسەڵات نییە، ئەوەتا کەس پشتی تێ نەکردووین و ئیش باشتر بووە نەک سست بووبێ، ئیتر بە دڵی خۆت.

ئامۆ: زیاتریش لەبەر دایکم و کچەکان هەر ڕۆشتنەوەکە باشترە.. کەواتە دوو ڕۆژ مجالم بدەنێ، لەگەڵ ئەو کۆمپانیایەی ئێرە کە ئیقامەکەشی بۆ دەرکردووین، پاکتاوێکی پارەوپوولمان ئەکەین و دوای ئەوە پێکەوە ئەڕۆینەوە.

نارەوەن(( زۆر دڵخۆش)): بە قوربانی کوڕی خۆم بم، هەی ئافەرین (( ئامۆو ئاوا دەستی ماچ ئەکەن و ئەویش سەریان ماچ ئەکا)) بە قوربانتان بم، من لە ئێوە زیاتر کێم هەیە کوڕە باشەکانم.

ئامۆ: ببورە دایکە دڵمان شکاندبی، لەمەولا ڕوو ناداتەوە.

خدر: دەستتان خۆش، سوپاس بۆ بڕیارەکەتان، بەخوا ئەم دایکەتان پیس منی ڕەتاندووە، کە هاتنەوە منیش پشوویەک ئەدەم.. (( پێکەنینی هەمووان)) دەی گەر زەحمەت نییە یەکێکتان بمبەنە ئوتێلێکی باش، با هەموو پشوویەک بدەین.

ئاوا: ئوتێلی چی کاک حەمەخدر گیان.. ئەوە هەمووی ژوورە.. من و ئامۆ لێرە ئەنووین و ئەو دوو ژوورەش یەکیان بۆ جەنابت و ئەویتریش بۆ دایکم.. سەرو زیادتانە، کەس نایەت بە لاتانا.

خدر: ئاخر ئەڵێم با تەواو سەربەستیی خۆتان وەرگرن.

ئامۆ: سەربەستیی خۆمان بە زیادەوە وەرئەگرین، عەیبە ئەو قسانە.

نارەوەن: دەی ڕاست ئەکەن حەمە خدر گیان، بچۆ ژووری خۆت ئەگەر مەبەستت پشووەو خەوت دێت.

خدر: نا بۆ ئوتێل گرتن درەنگ بوو، ئەگینا بۆ خەو زووە.

ئامۆ: لە بەیانیشەوە سەیارەیەکتان بۆ ئەگرم بە تایبەت بتانبا بۆ گەڕان، شوێنی مێژوویی و کەلەپوریی جوانی لێیە.. تا ئێوارە لە گەشت و گەڕان بن و سەعات ٦ بتانهێنێتەوە بۆ ئێرە، پشوویەک ئەدەین و پێکەوە ئەچینەوە دەرەوە.

نارەوەن(( پێکەنین)): جا وەڵا بۆ خۆت بڵێ نارەوەن بمرەو تەواو.

ئاوا: دووسێ ڕۆژە، با تەواو دنیا ببینی و تێر ڕەسمیش بگری.. گوێ مەدەنە ماندوویێتیی، تۆ وتت چی کاک حەمەخدر؟

خدر: وەڵا من بیرم لای گەڕان هەر نەبوو.. بەڵام وەک ئێوە ئەیڵێن، چی لەوە خۆشترە، خەمت نەبێ نارەخان، ناهێڵم پەکت بکەوێ زوو زوو پشوو ئەدەین.

ئامۆ: نارەخان؟؟؟؟؟ وەڵا جوان بانگی ئەکەی.. ئەوەندە خۆش بوو بە دەمت، ئیتر منیش هەر پێی ئەڵێم نارەخان.

نارەوەن: هەرچییەک ئەڵێن بڵێن من پێم خۆشە بە قوربانتان بم.

ئاوا: خوا نەکا.. منیش ئیتر هەروا ئەڵێم نارە خان.. واو چەند خۆشە ناوەکەت..(( سەر بۆ خدر دائەنەوێنێ)) مێرسی کاک حەمەخدر!

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٤٤٩ –ش/ن – ماڵی تایەر:

((تایەر چا ئەخواتەوەو بە ڕووی گرژەوە هەڵئەسێت بەرەو ژوورێک بچێت))

باوک: ئەوە بۆ کوێ یەکانە "یەکانە واتە بەرازی نێر"؟ تۆزێ لەناومان دانانیشی!؟

تایەر: ئەچمە ژوورەکەی خۆم.

باوک: چییە خیشەکە بەری نەدای؟

تایەر: خۆ بەراز نیم خیشم کردبێ؟! خیشی چی؟

باوک: وەرە کوڕم با من و تۆ ڕێککەوین!

تایەر: هیچ ڕێککەوتنێکم لەگەڵ لەگەڵ هیچ کەسێکا نییەو تەواو.

باوک: تۆ وەرە بابە وەرە خۆت شێت مەکە، دە تۆ وەرە چەند شتێک هەیە پێت بڵێم، ئەگەر ئاسایی بوو بەلاتەوە، ئەوا ژنەکەت بۆ دێنم.

تایەر: بیخەرە شەوێکیتر هیچ حەوسەڵەیەکم نییە گوێ بگرم.. ئەی ئەوە کوڕە نازدارەکەت لە کوێیە شەو و ڕۆژ بەدواتەوە بوو؟ ئەوە نیوە شەوە بۆ لەو ناپرسیتەوە؟

باوک: ئەی ئەوەتا خۆ تۆ نەشگەیشتوویتە تەمەنی ئەو و کە بانگت ئەکەم بێی دانیشی، وەک بەراز خیشم لێ ئەکەی.. تۆ بۆ مەسڵەحەتی خۆت خیشم لێ ئەکەیت و ئەویش لە تۆ گەورەترەو بەدوای مەسڵەحەتی خۆیا ئەگەڕێ.

تایەر: جا وەکو منی پێ ئەکرێ؟ یان هەر خەریکی دزییەکانی ئەبێت.. ئەیبینینەوە!

باوک: دە چەڵتەچەڵت مەکە برای گەورەتە، حەددت نەبێ دەم لە ئاستیا هەڵێنی!

((تایەر ئەچێتە ژووری خۆی))

Cut

دیمەنی – ٤٥٠ – ڕ/ د – دوکانی لەنگە:

(( ئدریس و شاخە لەبەر دوکاندا بە پۆزێکی زۆرەوە وەستاون و زایەریش کەساسانە لەبەردەمیاندایە، بە دەنگی نزم قسە ئەکەن))

زایەر: بەسەرچاو، خەمی منتان نەبێت، بەخوا چیلکەی دانم دەستکەوێت ئەیدزم، کورە باوکم هەر شێت ببوو بە دەستمەوە.

شاخە: چیلکەی دانمان ناوێت، تەنها بۆ پارەو ئاڵتون ئەچین و هیچیتر، ئێمە بەس کرێ وەرئەگرین تێگەیشتی؟ پارەکە بۆ خەڵکیترە بۆ ئێمەش نییە.

زایەر: هەر بەسەرچاو، ئەوەی بە هەقدەستانە وەریئەگرم، بەسمە.

ئدریس: ئای!!! کاکم سەلاجەیان بۆ چاک ئەکاتەوە، هەقدەستی ئەوێ.

زایەر: هەرچییەک لە ئێوەوە بێ بە هەر ناوێکەوە بێ، بۆ من سەربەرزییە.

ئدریس: ئیتر شەو ئەتبینین، بزانین چ پیاوێکی؟!

شاخە: خەمی زایەرت نەبێ، من خۆم ئەزانم چ هەڵۆیەکە، لە مناڵییەوە ئەیناسم، بەخوا بەخوا، ١٠ دەقە نابا، ماڵەکەت بۆ سەرەوژێر ئەکاو هەمووی ئەدا بەیەکا، هەرچی تیابێ کۆی ئەکاتەوە.

ئدریس(( بۆ زایەر)): ئەی بۆ حەماڵیت نەکرد؟ پارەی چاکت دەست ئەکەوت.

زایەر: کورە کاکە ئدریس دزیی زۆر خۆشە.. هەر لە پڕێ ئەتکا بە کوڕێ.

شاخە: تۆ بەس بۆ دزیی و پیاو کوشتن لەگەڵا ئەبی زایەر، بۆ ئیشیتر ئەبێ پرسی گەورەم بکەین.

زایەر: بە دڵی خۆتان.

(( بەرەو ناو دوکانەکە ئەچن))

Cut

دیمەنی – ٤٥١ – ڕ/ د - ئەهراماتی میسر:

(( نارەوەن بە کاوبۆی شین و بۆدیی مارۆنییەوە و خدر بە چاکەت و پانتۆڵی ڕەش و کراسی شینەوە، لە بەردەمی هەرەمێکدا وەستاون))

خدر: لەوێ بوەستە زۆر جوانە، ئەم ڕەسمەت زۆر زۆر جوان ئەبێ.

نارەوەن: باشە بە پێوە ئەوەستم، بەس تا کەمەر دەربکەوێ و لە پشتیشەوە با هەرەمەکە تا لوتکە دەربکەوێ.

خدر(( خۆ ئامادەکردن بۆ وێنە گرتن)): واو ئەو جلە مارۆنییەت چەند جوان لەگەڵیا هاتۆتەوە، هەر ئەڵێی ڕەنگناسی وا ئەو ڕەنگەت لەبەر کردووە.

نارەوەن: ئاخر بۆیە لێرە وتم تا کەمەر، بۆئەوەی هەر مارۆنییەکە دەربکەوێ، نەک کاوبۆ شینەکە، ئەی چۆن؟

خدر: دەی بەسەری خۆت زۆرزان، ئەبێ سبەی تۆ ڕەنگم بۆ هەڵبژێری.

نارەوەن: باشە دوو سێ تیشێرتی ڕەنگاو ڕەنگت بۆ ئەکرم کە چووینەوە بازاڕەکە.

خدر((بە دەنگی بەرز)): قبوولاااااااا.

نارەوەن: شێت!!!!

خدر: بجوڵێ نارە خان، با درەنگ نەکەوین، شوێنیتر ماوە.

نارەوەن: ناوەڵا بابچین پشوویەکبەین.. زۆر ماندوو بووم.. ڕۆژیش درەنگی کرد.

خدر: بەسەرچاو.

(( پێکەوە ئەگەڕێنەوە بەرەو چاخانەیەک یان ڕێستورانتێک))

______ تابع ________ Cut ____________

دیمەنی – ٤٥٢ – متبوع – ڕ/ د – میسر/ ڕێستورانت:

Mute

(( نارەوەن و خدر بەرەو ڕێستورانتەکە ئەچن و دائەنیشن))

Cut

دیمەنی – ٤٥٣ – ش/ د – بەردەمی ماڵی نارەوەن:

Mute

(( شاخەو ئدریس و زایەر بە سەیارەیەک دێن و لە بەردەم ماڵی نارەوەندا دائەبەزن و بە دیواردا هەڵئەگەڕێن بۆ ماڵی نارەوەن.. لە ماڵی ئاکۆوە، دیار لە پەنجەرەوە ئەڕوانێتە دزەکان))

Cut

دیمەنی – ٤٥٣ – ش/ ن – ماڵی ئاکۆ:

(( دیار بە ڕاکردن بە قادرمەدا دێتە خوارەوە بۆ لای دایک و باوکی کە لە هۆڵەکەدا ڕاکشاون لەسەر قەنەفەو تەماشای تەلەفزیۆن ئەکەن))

دیار(( بە دەنگی زۆر نزم)): باوکە باوکە!!

ئاکۆو گێلاس: ها چی بووە؟ چی ڕوویداوە؟

دیار: سووک قسە بکەن سووک.. سێ دز چوونە سەر ماڵی کاک دارەوان.

گێلاس: ئەیرۆ کەی؟

ئاکۆ: چۆن زانیت دزن؟

دیار: کورە ئێستا ئێستا.. لە سەیارەیەک دابەزین و خۆیان هەڵدایە ئەودیوەوە.

گێلاس: ئەک باوانیان شێوێ، جا خۆ کەسیان لە ماڵ نیین.

ئاکۆ: دیارە فرسەتیان لەوە هێناوە.. ئا گێلاس تەلەفونێ بکە بۆ پۆلیس و ناونیشانەکەیان بدەرێ.

گێلاس: وەڵا خۆت بیکە، من ناوێرم، دەمم تەتەڵە ئەکا.

ئاکۆ: ئاواش ئەبی بە سەرمایەدار؟ هههە.. باشە خۆم ئەیکەم.

گێلاس: مادام واتوت، شەرتبێ خۆم بیکەم.. (( مۆبایلەکەی هەڵئەگرێ و ژمارە لێ ئەدا)) ئەلوو، پۆلیسی فریاکەوتنە؟...... کاکە فریاکەوون دز هاتۆتە سەر ئەو ماڵەی بەرامبەرمان و کەسیان لە ماڵ نیین......... ناونیشانەکە؟...... توخوا با مێردەکەم بتداتێ ئەو شارەزای ژمارەی کۆڵان و گەڕەکە.

Cut

دیمەنی – ٤٥٤ – ش/ د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( شاخە لەبەر دەرگای کراوەی ماڵی نارەوەن دێت و ئەچێ.. لە دوورەوە دەنگی سەیارە دێت))

شاخە: ڕاکەن جەماعەت پۆلیس هات!

(( شاخە ڕائەکاتە ناو سەیارەکەوەو ئدریسیش زۆر بە پەلە دێت و ئەچێتە سەیارەکەوە.. زایەریش قاچی لە شیشێکی باخەکە دەئاڵێت و ئەکەوێ بە دەما.. ڕائەکات و بە سەیارەکەی شاخە ڕاناگات، بە پەلە سەیارەکە دەرئەچێت و زایەریش بە دوایدا ڕائەکا..

دوو سەیارەکەی پۆلیس ئەگەنە سەری کۆڵانەکەو دوایان ئەکەون و تەقە ئەکەن.. سەیارەکە ون ئەبێت و پێش ئەوەی زایەر بگاتە سەر سوچی کۆڵانەکە، پۆلیسەکان کەمێک دوورن قاچی بریندار ئەکەن، .. کەسێک بە ماتۆڕێکەوە دەرئەکەوێت و فیشەکێک ئەنێت بە سەری زایەرەوەو ئەکوژرێت و بە پەلە دەرئەچێت، پێش ئەوەی پۆلیس بگاتە سەری، نە سەیارەو نەماتۆڕ هیچیان دیار نامێنن))

Cut

دیمەنی – ٤٥٥– ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هەندرێن نان و ماست ئەخواو گرژە.. ئەردەڵان و هاوڕێ لە تەنیشتییەوە ))

هاوڕێ: ئای خوایە ئەو ژنە بۆ ئەوەندە نەگبەتە.. وا مێردی تیا ئەچێ و کوڕی سەرگەردان و جا تەقەی لێ ئەکەن و ماڵی ئەبڕن و تۆ سەیری ئەو هەموو نەگبەتییە؟

هەندرێن: ئێستا قسەم لەگەڵا کرد، ژمارەی ئەو هەڵشۆ خوێڕییەی زاوای دامێ وتی با لەگەڵتابێ، ئێستا دێت.. من نازانم چی بکەم؟ مەگەر ئیشی ئێرە هەموو ڕاگرم.

ئەردەڵان: ئەی ڕاستە ئەڵێن پۆلیس دزێکی لە ماڵیانا کوشتووە؟

هەندرێن: نا شوێنی کوشتنەکەیم بینی، سەرسوچی کۆڵانەکەیە، لەوانەیە پۆلیسیش نەیکوشتبێ.. ناشهێڵن کەس لە ماڵەکەیان نزیک بکەوێتەوە.

هاوڕێ: ئێ وایە جارێ لێکۆڵینەوە ئەکەن، خۆ کەم نییە.. چۆن لەوانەیە پۆلیس نەیکوشتبێ، ئەی کێ کوشتوویەتی؟

هەندرێن: ئەڵێن ئەو لە دەست پۆلیس هەڵاتووە، یەعنی پشتی لە پۆلیس بووە، کەچی فیشەکیش بەر ناوچەوانی کەوتووە.. خۆ لەوانەیە هەر واتەواتی خەڵک بێت، کێ ئەڵێ وایە؟

هەڵشۆ(( بە پەلەو هەناسە بڕکێ و شپرزەییەوە دێت)): ئەوە زەحمەت نەبێ کاک هەندرێن!

هەندرێن: تۆ کاک هەڵشۆی؟

هەڵشۆ: بەڵێ بەڵێ تۆ کاک هەندرێنیت؟

هەندرێن: بەڵێ من بووم تەلەفونم بۆ کردی، نارەوەن خان ژمارەکەتی دامێ.

هەڵشۆ: ئەوە چی ڕوویداوە لە ماڵی خەزوورم؟

هەندرێن(( دەست لە خواردن هەڵئەگرێت و هەڵئەسێتە سەرپێ، بە پێوە چاکەی تەواو ئەکا )): کاکە ئەمشەو دز چۆتە سەریان و ئەڵێن یەکێکیشیان کوژراوە.

هەڵشۆ: ئەی هیچیان بردووە؟

هەندرێن: کەس نازانێ.. جارێ پۆلیس دەوری ماڵەکەی بە قردێلە بەستووە، کەس بۆی نییە بچێتە ژوورەوە.. بەس وەک دەرئەکەوێ، مادام تەقەی تیا کراوە، ئەبێ هیچیان نەبردبێ.

هەڵشۆ: ئای خوایە گیان لەم نەگبەتییە، نابێ ئێمە بێ بەڵا بیگوزەرێنین.. هەستە با بچین، بەڵکو سا ئەمە خوایە بهێڵن ئێمە بچینە ژوورەوە.. ئاخر توخوا تۆ بڵێ ئەمە وەختە ئەوانیش خەریکی گەڕان و پیاسەن؟

هاوڕێ: ئێ ئەویش چی بکا برا؟ چوزانێ ماڵ چۆڵکا دز ئەچێتە سەری؟

هەڵشۆ: ڕۆژەکەی وایلێهاتووە، کەس ناتوانێ بە سەعاتیش ماڵ چۆڵکا، نەخوازەڵا بە هەفتە.. بەڵام هەمووی لەژێر سەری ئەو خدرە خوێڕییەی بەردەستیایە.

ئەردەڵان: قسە بە کاک حەمەخدر نەڵێی کورە.. ئەوە هاوڕێی منە لێت قبوڵ ناکەم.

هەڵشۆ: جا نۆرەی ئەم بەزمەیە، (( بۆ هەندرێن)) هەستە برا با بڕۆین تا توشی بەزمێکیش نەبووین.

هەندرێن: هەر بۆ زانیاریی خۆت، کاک حەمە خدر بەردەست نییە، شەریکە.. فەرموو با بڕۆین.

هەڵشۆ: دیارە خدر پیاوی باشی لەمناوە هەیە؟!

هاوڕێ: باش و زۆریش هههههه

(( هەندرێن و هەڵشۆ ئەڕۆن، ئەچنە سەیارەکەی هەڵشۆوە))

__________ Cut __________

دیمەنی – ٤٥٦ – ڕ/ د - سەرجادەیەک لەمیسر:

(( نارەوەن و خدرو ئامۆو ئاوا، لەبەردەم سەیارەیەکی تایبەتدا))

نارەوەن: کوڕم حەوسەڵەی پیاسەو گەڕانم لەکوێ بوو، ئەوە ماڵەکەشی هاتە سەر، خوا ئەزانێ ئێستا چییان لەو ماڵە کردووەو چۆن لەوتاندویانە؟!

ئامۆ: توخوا خەمی ماڵتە دایکە؟

نارەوەن: ئەی چۆن باوانم.. بۆ ماڵ کەمە؟

ئامۆ: ئاخر نە تیرۆژو نەپارەو ئاڵتون و نە شتی گرانبەهاش هیچ شتێکی تیانییە تا خەمی بخۆیت.. ئەوەش باوکم هەر لە جێی خۆیەتی.. جا وەک دوێنێ گەڕانی خۆت کرد.. ئەمڕۆش بچن پیاسەیەکی ئەسکەندەرییە بکەن و تا کاتی گەڕانەوەمان دێت سێ سبەی، ئێمەش شەرەم شێخ و موزەخانەتان ئەگێڕین.. ئێستا سەیارەکە دێت و هەر گوێشی مەدەرێ، چاوی ماڵ دەرئەهات.

نارەوەن: بەخوا کوڕم مەگەر بۆ کات کوشتن بچم، ئەگینا ڕۆشنایی لە دڵما نییە.. خۆ خدر نەبێ جاروبار سوعبەتێ، قسەیەکی خۆش ئەکا، ئەگینا ئەو دڵەم ئەتەقی.

ئاوا: دە کاک حەمەخدر گیان توخوا قسەی خۆشی لێ مەبڕە، ئەگەر قسەشت لێبڕا، تەلەفونێکم بۆ بکە تازەترین نوکتەت ئەدەمێ!

(( پێکەنین))

نارەوەن: ئاوا؟! گاڵتەشم پێ ئەکەی ئاوا حەوت دان!!! هههههه (( چەپۆکێکی پیا ئەکێشێ))

(( سەیارەیەکی تایبەت دێت و خدرو نارەوەن سەرئەکەون و ئامۆو ئاواش ئەچنە سەیارەی خۆیانەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٥٧ – ڕ/ د - حەوشەی ماڵی ئاکۆ:

(( نامەیەک بە شێوەیەکی لوولەکیی پێچراوەتەوە بە تیپ.. گێلاس لەبەردەرگایە سەرێکی دەرەوە ئەدات و دێتەوەحەوشە بە نیازی پاککردنەوە، نامەکە لە شوێنێکی چەپەکدا ئەبینێت، وەک هەڵدرابێتە حەوشەکەوە.. بە پەلە هەڵی ئەگرێتەوە))

گێلاس (( لەبەرخۆیەوە)): ئای خوایە ئەمە چییە؟

(( بە خێرایی بەرەو ژوورەوە ئەچێت))

تابع ——— Cut

دیمەنی – ٤٥٨ – متبوع- ڕ/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس بە خێرایی دێتە ژوورەوە.. ئاکۆ دانیشتووە تەماشای مۆبایل ئەکا ))

گێلاس(( دەنگی ترساو)): ئاکۆ ئاکۆ!! ئەها چیم لە حەوشە دۆزییەوە؟

ئاکۆ: ئەوە چییە؟ ئادەی ئادەی.. (( گێلاس خەریکی نامەکە ئەبێ)) ئادەی بێنە بمدەرێ.. (( بێ حەوسەڵە)) ئەرێ دەبێنە (( وەریئەگرێ)) ئاهـ!!!!!

گێلاس: ئەرێ ئەوە چیتە ئەوەنە بێ حەوسەڵەی؟

ئاکۆ(( هەوڵی کردنەوەی ئەدا )): ئەمە لە کوێیا بوو؟

گێلاس: سەرێکم کێشایە دەرەوەو ویستم حەوشەکە پاک بکەمەوە، ئەمەم بینی.

ئاکۆ: ئا چەقۆیەکی میوەم بۆ بێننە!

گێلاس (( ئەچێ بۆ چەقۆکەو ئەگەڕێتەوە)): ها ئەوەش چەقۆ.

ئاکۆ (( چەقۆکە وەرئەگرێ و تیپەکە لەت ئەکا، نامەکە دەرئەهێنێ، ئەیکاتەوەو ئەیخوێنێتەوە)): ئاکۆی نامبارەک.. ئێمە لە تەرەفی پاشاوە قسەت لەگەڵا ئەکەین.. ئەو خانوەی کاک ڕێشار، کە لە موزایەدەیا هەڵتگرتۆتەوەو پێشتر تیا نیشتەجێ بوویت.. بەو تەمسیلیە بێتامەی حوکمەت دروستی کرد تا خانوەکەت بۆ بگێڕێتەوە، پاشای تورە کردووە.. لە ماوەی مانگێکدا چۆڵی بکەو کەس توشی سەرێشە مەکە.. ئەگینا ئەمجارە بە شکاندنی قۆڵ و باڵت ناوەستینەوەو زیانی زۆر گەورەتان پێ ئەگا.. کەس نەیتوانیوە لە قسەی پاشا دەربچێت و لە ژیاندا بمێنێتەوە.

گێلاس (( ترس و تۆقین)): ئەوە ئەڵێن چی ئاکۆ؟ خۆ بەڕاست ئەوان دەعمەکەیان کردووی.

ئاکۆ (( ترساو)): بە پەلە ئەبێ ئەم نامەیە بگەیەنینە پۆلیس و خانوەکەیان بدەینەوە، باوەڕیش ناکەم وەریبگرنەوە.. ئای خوایە پیس تیاچووین!! ئەڵێم ژنەکە لێگەڕێ و شوێنلەقمان مەکە.. جا تۆ بە قسەی کەس ئەکەی؟ ئەهـ ئەوەش

ئەنجامەکەیەتی ببیینە، هەر باش بووە نەشیان کوشتووم.. وەڵا ئەوە خانوومان کڕی و تیا حەساینەوە.. خۆ هەر ئەموت خوایە بۆ کەس ناوێرێ خۆی لە قەرەی بدات و وا بە ئاسانیی بۆ ئێمە دەرچوو؟ تومەس بەزمی بەدواوەیە.. منیش کەر کەر لەسەر قسەی ژن بەدەستی خۆم بەڵام سازان.

گێلاس: دەی تۆش دامەبارێ بەسەرماو کەم سەرزەنشتم بکە.. ئەگەر ئاوا تۆقیوی، خۆم هەمووی چارەسەر ئەکەم.

ئاکۆ: تازە بە چی چارەسەری ئەکەی؟ قوڕت بۆ گرتمەوە گێلاس.

گێلاس: ئەزانی پیاوەکە وەک سەرزەنشتی دراوسێیەکت بکەی ئاوا قسە ئەکەی؟! ئەم گرمە گرمەی بۆچییە؟ منیش نەمئەزانی وای لێدێت، وەک واشی لێهاتووە، بیر لە چارەسەر بکەیتەوە باشترە، نەک من تۆمەتبار کردن.. ئەگەر هیچیشت پێ ناکرێ، بێدەنگ بی باشترە.

ئاکۆ (( تووڕە )): دەی باش، شەرت بێ نەیەم بەلاتا، ئا با بزانم چیت پێ ئەکرێ هەی نیوەکەی کۆمەڵگا؟

گێلاس: سوکایەتی مەکە هەی نیوەکەیتری کۆمەڵگا.. تەنها دەرفەتم بدەرێ و ئەوسا بۆت ئەسەلمێنم ئەوەی ئێوە پێی ئەڵێن زەعیفە چی پێ ئەکرێ؟!

ئاکۆ: بەخوا تا سەری یەکێکمان نەدەی بە فەتارەیەکا داناسکنێی!

گێلاس: سەرم لێ مەشێوێنەو با بیر بکەمەوە، دڵنیا بە ناهێڵم هیچت بەسەر بێ.. (( بەدەم چوونە دەرەوەوە)) پیف بۆ چ پیاوێکی، وەڵا وامزانی بیکەیسی لە سەربان دائەبەستی. پیفففففف.

Cut

دیمەنی – ٤٥٩ – ش/ن – ماڵی پاشا:

(( پاشا بە تورەکەی ڕەشی سەرداپۆشینەوەو هەردوو پاسەوانەکەی پشتی شامورادیش بەوجۆرەو شامورادیش بە ترسەوە بە پێوە وەستاوە ))

پاشا: گوێ بگرە شاموراد! نەک ئەو هەتیوەی بۆ دوو ڕۆژ و بە هەڵە دزیەکەتان پێکرد، ئەگەر تۆش بگەیتە ئەو حاڵەتەی بکەویتە بەردەستی پۆلیس، دڵنیابە ئەکوژرێی.. ناهێڵم هیچ نەفەرێکی لای من بکەوێتە بەردەستی پۆلیس و نهێنیمان ئاشکرا بێت.. بەڵێ من خەڵکم ڕاسپارد بوو هەر کەسیان گەیشتنە مەترسیی دەستگیر کردن، بکوژرێت.. ئەو هەتیوەش بریندار کرابوو، توانای ڕۆشتنی نەمابوو، هەر بە بەشوێن پێی خوێنەکەیا ئەگیرا.. کوشتنی باشترین چارەسەر بوو.

شاموراد: زۆر ڕاستە پاشا گیان دەستت خۆش بێ.

پاشا: جارێکیتریش بە ناوی منەوە نامە مەکە سەر کەس.. ئەو ماڵە تۆقیون و پۆلیسیان ئاگادار کردۆتەوەو ڕەنگە لەمەودوا چاودێریش بکرێن.. پێموتی هەڵەم ناوێ شاموراد.. ئەزانی یەک ئەقڵ بکەوێتە لێکۆڵینەوە لەو نامەیە، هەموو بە کلاو ئەگیرێن؟

شاموراد: ئەمرەکەی پاشا گیان ڕاستە هەڵەم کرد.

پاشا: ئەی بۆ کردت؟

شاموراد: ڕاستیەکەی پاشا گیان پێم ناخۆش بوو خانووەکەی ڕێشاری برامیان لە موزایەدەیا هەڵگرتەوە.

پاشا: هەردوو چاوت دەرئەهات، تۆ چیت تا شتت پێ خۆش بێ یان پێ ناخۆش بێ؟ هەڵسم وەک سیسرکێک لەژێر پێما ئەتفلیقێنمەوە سەگی گەڕ.. ئەبێ لەبەرئەوەی پێت ناخۆشە ئیتر بە ناوی منەوە بکەیتە سەر خەڵک؟

شاموراد: پاشا گیان قەت دووبارە نابێتەوە.. تۆبەبە.

پاشا: جا حەددت چییە دووبارەی ئەکەیتەوە؟ بیللاهی وەک چۆلەکە ملت هەڵئەکێشم.. ئەی چەندتان لە ماڵی ئەو ژنە دزیی.

شاموراد: پاشا گیان زۆر گەڕابوون، هیچیان بۆ نەدۆزرابۆوە.

پاشا: ئەک عەمرتان نەمێنێ.. هەتیوێکیشتان بە کوشتداو بە دەستی بەتاڵیش بۆم گەڕاونەتەوە؟ یاخوا داڕزێن..

شاموراد: پاشا گیان لەوانەیە ئەو ژنە پێشتر پارەکانی ناردبێتە شوێنێکیتر.

پاشا: من ئاگادار کرامەوە پارەی دەست تێوە نەداوە.. هەمووی لەماڵەکەیایە ئێستاش.. بەڵام کە هیچ لەبارانەبووی وەک تۆو خوێڕییەکانی بەردەستت ڕاسپێرم ئیشم بۆ بکەن، هەر ئاوا ئەبێ..

شاموراد: پاشای گەورە دڵنیابە لێپرسینەوەی باشیان لەگەڵ ئەکەم.

پاشا (( بە گاڵتەپێکردنەوە)): لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتا بکە قەشمەر! بەڵام دڵنیاش بە حەیتەزل، باجی هەڵەی داهاتووت، ژیانی هەرسێکتانە.. دەبڕۆ دەرەوە ملبشکێنە، زۆر خۆشیم بە چارەتا نایەت (( تورە)) بڕۆ دەی.

شاموراد (( بە ترس و پەلەپەل ئەچێتە دەرەوەو دوو پاسەوانەکەش بە دوایەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٦٠ – ش/ د – چەند جێیەک لە میسر:

Mute

(( ئامۆو ئاوا نارەوەن و حەمەخدریان بردووە بۆ چەند شوێنێکی گەشتوگوزاریی و گەڕان و پیاسە))

Cut

دیمەنی – ٤٦١ – ش/د – ناو خێمە:

(( پرسەی زایەر.. چەند پیاوێک دانیشتوون، هەموو بەجلی کوردی و جامانەوە تایەر نەبێت، لە ناویاندا باوکی زایەرو تایەری برای، شەماڵ و ئاکارو هاوکارو برزۆ))

باوک: وەڵا پۆلیس بانگی کردم و هەواڵی زایەری لێ پرسیم. کە شەو کەی چۆتە دەرەوەو شەوانیتر چۆن بووەو ئینجا ڕاستیەکەی شەویش کە نەهاتەوە، دڵم خورپەیەکی پیاهات، زۆر ترسام، پاڕامەوە لە خوا هیچ ڕووینەدابێ.

پیاوێک: ئەی زایەری ڕەحمەتیی لای خۆت ئیشی نەئەکرد؟ پێکەوە نەبوون؟

باوک: با با تا پێرێش هەر بەیەکەوە بووین.. پێرێ وتی باوکە ئیشێکی زۆر باشم دەسکەوتووەو وەک ئەوە بێ کە باسی ئەکەن ئیتر ئەبێ واز لە ئیش بێنی و هەر خۆم ئیش ئەکەم. ئیتر ڕاستییەکەی پێی نەوتم ئیشەکە چییەو لەگەڵ کێیە! کە پۆلیسیش لێی پرسیم وتم قەسەم بەخوا نازانم لەگەڵ کێ بووە بۆ ئیشە تازەکەی.. من وتم دەی خۆ دوایی هەر ئەزانم، ئیتر پرسیاری بۆچییە؟

پیاو: ئەی پۆلیس نەیزانی کێ تەقەی لێکردووە.

باوک: کاکە وەک بۆم دەرکەوتووە ئەم ڕاگوزەر بووە بەو گەڕەکەیاو ئیتر کە بووە بە تەقە، ئەم هەڵاتووەو پۆلیسیش وایزانیوە تاوانبارەکەیەو بریندار کردووە.. دیارە ئەو ماتۆڕسوارەشی کە تەقەی لێکردووە، هەر بە هەڵە کوشتوویەتی و ئیتر ئاوا قوڕەکەیان بۆ من گرتەوەو جەرگ سوتاویان کردم.. ئەگینا کوڕی من و تاوان؟؟؟ حەیهووووووووو!

پیاو: کورە زایەر زۆر پیاو بوو ئەو شتانەی هەر لێ نەئەوەشایەوە.. ئیتر وا ئەجەلەکەی بردوێتییە ئەو کۆڵانە.

باوک: ئەشهەدوو هەر ئەجەل بوو و هیچیتر.

بەگشتیی: خوا عافویکاو لە گوناحی خۆش بێت.. ئەمری خوایەو دەسەڵات نییە.

(( هاتنی خەڵکیترو ڕۆشتنی هەندێک و بەوجۆرەی ئسوڵی پرسەیە)) ـــــ Cut ـــــ

دیمەنی – ٤٦٢ – ش/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو گێلاس و دیار))

ئاکۆ: ژنەکە لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە بەساقەوبم.. ئاخر تۆ ئێستا ئەچی برای ڕێشار ئەدۆزیتەوە، کێ ئەڵێ ئەو نامەکەی بۆ هەڵداوینەتە حەوشەوە؟ بیکە بە خاتری خوا!

گێلاس: ئەرێ ئەوە تۆ چیتە ئاکۆ گیان؟.. بیر بکەرەوە بیر.. ئەوی پێی ناخۆشە خانوی ڕێشار بفرۆشرێتەوەو خەڵکی تێ بچێ، هەر کەس و کارەکەیەتی چاویان بەرایی نادا.. ئەگەر دەستی ئەو شامورادە خۆشی تیانەبێ، لەگەڵ کەسوکارا کۆئەبێتەوەو پەیامی منیان پێ ئەڵێ.. ئیتر بۆ تۆقیوی؟ من هەر ئەبێ لەم مانگەیا بگەمە ئەو کەسەی ئەو نامەیەی بۆ ناردووین.. جا شامورادە هەر کەسێکە.

دیار: جا سوودی چییە بیگەیتێ دایکە؟ وەک باوکمی کەلەپاچە کرد، سەیارەیەکیش بۆ تۆ ئەنێرێ و ڕەنگە بشتکوژێ کە بزانێ ئاشکرا بووە.. بە تایبەت کە پۆلیسیش زانیویەتی.

گێلاس: ڕۆڵە ڕاست ئەکەی ئەبێ هەموو شتێک لەبەرچاو بگرین، ئەم قسەیەی تۆش تەواوە.. بەس وەک ئەڵێن ئەوی بترسێ ناخڵەسێ.. یەکجار ئەو هەموو ترسەشی ناوێ نا.. بزانین دەمولەفزی ئەوان چۆنە.

ئاکۆ(( وەک لۆمە کردن)): کچێ ژنەکە!

گێلاس: دەتوخوا ئەگەر ئیتر بەسی نەبێ.. من ئەبێ شتێک بکەم، ژیان بە ترسەوە ناچێتە سەر.

ئاکۆ: دەی کەیفی خۆتە! بەس با شۆڕشی برات ئاگادار بێ باشترە.

گێلاس: نەک هەر شۆڕش، مامەحەمەو مامەیاسینیشم ئاگادار کردۆتەوەو زۆریان پێ باشە.. مامە حەمە هەر خۆی مەریوانی کوڕی ڕاسپارد، ئەم شامورادەیان بۆ دۆزیمەوە کە برایەتی و دوکانەکەشیان پێوتم.. هەر هەموو قسەکانی منیان بەدڵ بوو.

دیار: ئەوانیشت هێنایە سەر ڕێگەی خۆت؟

ئاکۆ: کورە تۆ ئەمە چۆن ئەناسی.. ئەوە من تۆزێ کۆنترۆڵم کردووە، ئەگینا بە کچێنی کاتێ حەز لێکردەم بوو، شتی وای ئەکرد خەریک بوو تێک ئەچووم.

گێلاس: بەخوا کوڕم گاڵتە ئەکا.. ئەوە جارێکیان دووان شوێنمان کەوتبوون، ئەم هەر زوو زوو ئەیوت پێ هەڵگرە با خێرا بتگەیەنمەوە لای ماڵەوە.. منیش وتم مەترسە ئەوە نیین.. وەڵا کەوتنە توانج هاویشتن و فیکە لێدان و ئەمسەرەوسەر.. منیش لە دوورەوە چاوم بە چەند کوڕێکی گەنج کەوت.. کە نزیکی کوڕەکان بووینەوە، بە هەموو تینم جانتاکەم کێشا بە سەرولوتی یەکێکیاناو خوێن فیچقەی کرد.. کاکە کوڕەکانیش نەیانکردە نامەردیی، بێ ئەوەی پرسمان پێ بکەن، کەوتنە تێهەڵدانیان.. بەس چ تێهەڵدانێک؟! هەر زۆر خراپ (( پێکەنین)) باوکت کەوتە ناوبژیی هههههە.. وەڵا دیار بوو دووانەکە زۆر مەمنونی باوکت بوون کە کوڕەکان نەیانکوشتن.. هەر هەستانەوەو ڕایانکرد.

ئاکۆ: خوات بێ من ناوبژیم کرد؟

گێلاس (( پێکەنین)): کورە ئەرەوەڵا دەستی کوڕەکانیشت ئەگرت لێیان نەدەن هههههە.

دیار(( خەندە)): ئەزانی باوکە لێت ئەوەشێتەوە؟ هههە پێتەوە دیارە زۆر لاشەڕیت.

ئاکۆ: ئەی خۆ وەکو دایکە شەڕانییەکەشت نیم؟!

(( لە میوتیدا دیالۆگ و پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٤٦٣ – ش/د – باخی حەوشەی ماڵی بروسک:

(( ڕێژوان و سەلواو چیمەن))

چیمەن: زەرەریان زۆر لێ کەوتبوو؟

ڕێژوان: ئەرەوەڵا هەرچی دەرگای هەبووبێ لەو ماڵەیا شکێنرابوو.. دەستم لە یەک شتەوە نەدا.. پۆلیسەکە وتی تەنها کێلونی دەرگاکان بگۆڕن و واز لە دەرگای شتەکانی ناوماڵ بێنن تا خۆیان دێنەوە.. بۆ ئەوەی خێرا لێبینەوە، منیش هاوکاریی وەستاکەم کردو کە تەواو بووین، کلیلەکانمان تەسلیمی پۆلیسەکە کرد.

سەلوا: بەدبەختییەکە هەمووی بۆ ژنی داماوە.. سەرباری وێرانکردنی ماڵەکە ئەبێ چەندیشیان لێدزیبن؟ خوا ئەزانێ هەر چیشیان بەسەر ئەو ماڵەیا هێناوە، بەخوا ڕەنگە هەر نەشبێتەوە بە ماڵ.

چیمەن: ئەی وتت بڵێن کوڕی کاک زوبێر چاکی کردۆتەوە؟

ڕێژوان: خۆ هەر بەوە لێنەگەڕان، بردیانم بۆ مەرکەزو لەوێ بەڵێننامەیەکیشیان لێوەرگرتم کە لەبەر کلیلەکانم نەگرتۆتەوە.. پرسیاری زۆریشیان لێکردم کە بۆ ئەوە ئەکەم؟.. وتم وەک پورم وایەو کوڕەکانیشی لێرە نیین. وەک کوڕی خۆی ئەوەم بۆ کردووە.

سەلوا: ئەوە زۆر باشە کە بە قسەی باوکت کرد، کە ئەو نارەوەن خانە گەڕایەوە پێی خۆش ئەبێ باوکت ڕایسپاردووی.

ڕێژوان: ئەی چۆن؟ هەرچەندە پۆلیس خۆی چاودێریی ماڵەکەش ئەکا تا ئەگەڕێنەوەو دواتریش هەموو کێلونەکان هەر ئەگۆڕن.. بەس ئەمەش باش بوو، کە دەرگا بە کراوەیی جێ نەهێڵراوە.

چیمەن: لەشت ساغ بێ.. ئەی لۆزەندەرەکەی زاواى لەوێ نەبوو؟

ڕێژوان: توخوا بەوەش ئەڵێن پیاو؟! ئەڵێی ئاو ڕایماڵیوە هههه ——— ———

——— Cut ———

دیمەنی – ٤٦٤ – ڕ/ ن – ماڵی تایەر/ ژووری تایەر:

(( تایەرو ئاکارو برزو و شەماڵ، بە شەرواڵ و کراسەوە دانیشتوون لە ژوورەکەی تایەر..))

ئاکار: هەر دەرنەکەوت کێ کوشتوویەتی؟

تایەر: نا، هیچ دیار نییە.. کەس نازانێت ئەم دوو ڕۆژە لەگەڵ کێیا ئیشی کردووە، هەر هیچ نەبێ بە هۆی ئەوەوە سەرەداوێکمان دەست ئەکەوێت.

ئاکار: کاکە خۆ تۆ بێکەس نیت، خوا نەیبڕێ ئەو هەموو خزمە هەیە، با بە هەموومان بگەڕێین بکوژەکەی بدۆزینەوە.. تۆ بڵێی وامان لێ هاتبێ هەروا بە ئاسانیی لێمان بکوژرێ و نەشزانین کێیە؟

تایەر: نەوەڵا ئاکار گیان نابێ ئاوا بە ئاسانیی تێپەڕێ.. ئەگەر پێشتر شتێکیان بۆ چووبێتە سەر بۆ خۆپاراستنمان لە بەڵاو کارەسات، ئەوە بەڵاکە هات.. بە ڕاستی ئیتر یەک زەڕڕە حەیامان نامێنێ ئەمە دیزە بە دەرخۆنە بکرێ.. ئیتر هەموو لایەک هیممەتکەن و بگەینە ئەو کەسە.

ئاکار: مادام ماتۆڕسوار بووە، من برادەری ماتۆڕسواری زۆرم هەیە، لەگەڵ برزو شەماڵ لێیان نزیک ئەبینەوە، بەڵکو سا ئەمە خوایە شتێکیان لێ هەڵکرێنین.

تایەر: قوربانتان بم هیممەتکەن و شتێکم بۆ حاسڵکەن.. تۆ بڵێی بدۆزرێتەوە؟

برزو: پشت بەخوا هەر ئەیگەینێ، ئەوەندەش دەستەپاچە نیین خەڵک بەسەر لاشەمانا بڕوا.

(( لە میوتیدا دیالۆگ و دواتر ڕۆشتنی گەنجەکان))

Cut

دیمەنی – ٤٦٥ – ڕ/ن – ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆو کرمانج دانیشتوون))

سەرکۆ: هەندێ شتی بچووکی تریش ڕوویئەدا، بۆ داپۆشینی تاوانەکانی دارەوان، باوەڕم نییە ئەو نامەیە لە گروپێکی تۆکمەوەی وەک ئەوی پێشووەوە نوسرابێ.

کۆژین: بەڵام گەورەم بۆ ناکرێت گروپێکیتر سوودیان لە هەڵەکانی ئەوان وەرگرتبێ و بە هەمان ڕۆڵەوە کار بکەن؟.. جەنابت ئەوە ئەزانی گروپەکان سوود لە یەک وەرئەگرن.

سەرکۆ: ئەوە ڕاستە.. بەڵام لە هیچ شوێنێکەوە سۆراخی بوونی گروپیتر نییە.. ئەوەی نارەوەن و خدرو لێدانی ئاکۆو نامەکەو دزییەکەش کاردانەوەیە.. مانای وا نییە فەرامۆشیان بکەین، ئەوەش هەر تاوانە گەر لە سنوری چالاکیی ئێمەشدا نەبێت، هەر جۆرە زانیارییەکمان دەست بکەوێ گرنگە.

کۆژین: لەو بڕوایەدا نیت براکەی ڕێشار، دەستی هەبێت لە پشتی ئەم ڕووداوانەوە.

سەرکۆ: چاودێریی لەسەرە، هیچ ئەنجامێکیش دەست نەکەوتووە، وەک ئەڵێن تا ئێستا تەنها جارێک سەردانی ڕێشاری کردووە، بەوەش گومانی لەسەر کەمترە.

کۆژین: ئەی ئەگەر ئەو سەردانیی نەکردنە دروست لەبەر ئەوە بێت؟

سەرکۆ: چاودێریی بەردەوام ئەوەش دەرئەخا.

کۆژین: کەواتە سنوری چاودێریم بەرفراوانترە گەورەم.

سەرکۆ: نا دابەشکراوە بۆ دوو ناوچە.. ناوچەی گەیم و ناوچەی بلاک، دۆسیەیەک لای تۆو ئەویتر لای ڕاهۆز ئەبێت.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤٦٦ – ڕ/ د – دوکانی لەنگەکە:

(( شامورادو گێلاس دانیشتوون و ئدریس و شاخەش سەرقاڵی بەڕێکردنی خەڵکن))

شاموراد (( نەرم و بەبەزەیی خۆی نیشان ئەدا)): نا دایکەکەم، هەرکەس نامەی کردۆتە سەر ئێوە ناماقوڵیی کردووەو سەریشی دای لەبەرد.. واریس و بەرپرسی ڕێشار هەر من و خوشکەکەمین، ئێ وا بەهۆی ئەو زروفەوە هەموو سەروەتەکەی دەستی بەسەرا گیراوەو دەستی حوکمەتیش خۆش بێ ئەوەی کردووە.. ئیتر ئەو خانوەشی وەک تەواوی شتەکانیتری بووە بە موڵکی حوکمەت.

گێلاس: ئەمە دڵنیابییە کاکە شاموراد یان هەر قسەیە؟ چونکە ئێمەش پارەمان پێداوە؟

شاموراد: لە منەوە دڵنیایی وەرگرەو قاچی تیا درێژکەن.

گێلاس: ئەی ئەو پاشاو ماشایەی لە نامەکەیا نوسرابوو؟

شاموراد: وەک وتم قسەی من وەرگرەو خەمی هیچت نەبێ دایکەکەم، تۆ ئەڵێی مانگێک مۆڵەتیان داوین، بڕۆ ساڵێکیتر ئەم حەلە وەرەوە بۆلای من و هەرچی ڕوویدا یەخەی برای خۆت بگرە.

گێلاس (( هەڵئەسێ)): ئەک یاخواماڵت ئاوابێ کاکە شاموراد.. من منەتباری تۆم بۆ ئەو هەموو پیاوەتیەی لەگەڵت کردم.

شاموراد: ڕوو سپی بی دایکەم.. ئێمە خەڵکی شارێکین، هیچ پێویست بە سوپاس و منەت ناکا.. بڕۆ لە ئامانەتی خوادا بیت و یاخوا پیرۆزتان بێ.

(( لە میوتیدا ڕۆشتن و گەڕانەوەو دانیشتنی شاموراد لەسەر کورسییەکەی خۆی))

Cut

دیمەنی – ٤٦٧ – ڕ/ن – شوقەکەی میسر:

(( نارەوەن و ئامۆ دانیشتوون))

ئامۆ: ئەها، مەبەستت ڕێژوانی کاک زوبێرە، ئەو کوڕە بێدەنگەکە؟

نارەوەن: ئا ئا.. بەخوا زۆر کوڕێکی ڕوح سوکە، ئا.. ئەو کێلونی بۆ دەرگاکان کردووە.

ئامۆ: دەی زۆر باشە ماڵی ئاوا بێت.. ئەگەر سبەی دەرچووین، کە چووینە ناو بازاڕەکە، دیاری بۆ خۆی و خێزانیشی ئەکڕین.

نارەوەن: ئەی چۆن؟ بۆ دایکیشی، ئەویش لەگەڵیانا ئەژی. (( حەمە خدرو ئاوا دێنە ژوورەوە)) دەستکەوت؟

ئاوا: حەز ئەکەی بۆ ٣٠ کەسیتریشی ئەبرم.

ئامۆ: بۆ بەیانییە؟

خدر: نەوەڵا بۆ ئەمشەوە، سەعات ٣ ئەبێ لە فرۆکەخانە بین.

نارەوەن: دەی با تۆزێک ئەمناوە پاککەینەوە، خۆ ئاوا نایدەیتەوە خاوەنی؟

ئاوا: خاوەنی چی؟ بە ناوی خۆمانەوەیە.

نارەوەن: ئەی بۆ نەتانفرۆشتەوە کوڕم؟

ئامۆ: با هەر هەبێ، گەشتێکە، لێقەومانێکە، دنیا هەزار شتە.

نارەوەن: دەی بە دڵی خۆتان.

ئاوا: بەرگی خۆی هەیە پێش دەرچوون هەمووی ئەدەین بەسەریاناو دایانئەپۆشین و جێی ئەهێڵین.

(( ئەگەر مەبەست بوو دەرهێنەر ئەتوانێ چەند دیمەنێکی گەڕانەوەیان، تۆمار بکات، بۆ چەند دیمەنێکی دواتر)) ________________ Cut

دیمەنی – ٤٦٨ – ڕ/ د – ناو سەیارەی تایەر:

(( تایەرو ئاکار چاوەڕوانی برزو و شەماڵ ئەکەن و پاش کەمێک پەیا ئەبن))

ئاکار: تۆ باوک و دایکت ئارام بکەرەوە، ئیتر خەمی هیچت نەبێ.. قەسەم بەخوا مردووی ژێر ئەرزیش بێ زیندووی ئەکەمەوەو ئەیکوژمەوە.

تایەر: ئێستا باوکم هەر خۆیەتی و میوانیش زۆرە، زۆر بەزەییم پیایانا دێتەوە بەم ئەخیری عومرەوە جەرگ سوتاو بوون.

ئاکار: تۆڵەی ئەکەینەوە.. ئەوە هاتن!

(( برزو و شەماڵ دێنە ناو سەیارەکەو پاش سڵاو و وەڵام))

تایەر: چی بوو برزو؟

برزو: برادەرێکمان ئەیوت باوەڕ مەکە لەناو ماتۆڕسوارەکانا بیدۆزیتەوە.. ئەوانەی ماتۆڕ بۆ پیاوکوشتن بەکار ئەهێنن، ناوێرن لە دەوروبەری ئێمە دەرکەون.. ئەوان ماتۆڕ بۆ ئیشی تایبەت بەکارئەهێنن، نەک هیوایەتیان بێ.

ئاکار: ئەی پێت نەوتن ئەگەر شتێکی نامۆیان بینی پێتان بڵێن؟

شەماڵ: با ئاکار چۆن نایڵێین؟

ئاکار: دەستخۆش شەماڵ گیان، ئیتر ئومێدم بە ئێوەیە.

برزو: بەخوا زیاد لە توانای خۆمان بۆی ئەگەڕێین، دڵنیابن.. برای حەمە تایەرە، برای ئێمەشە.

تایەر: سوپاس برزو گیان.. شەماڵ گیان تۆش.. عەزێت ئەکێشن ممنونم

شەماڵ و برزو: نا بابە عەزێتی چی؟ تۆ برا گەورەی ئێمەیت.

(( هەندێ حواریترو دابەزینی شەماڵ و برزو و تایەریش دەرئەچێ))

Cut

دیمەنی – ٤٦٩ – ڕ/د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( پۆلیسێک لە دەرگا ئەدات.. گێلاس بە سەیارەکەی دێتەوە.. دائەبەزێت))

گێلاس: فەرموو کاکە، ئەوان لە ماڵ نیین، هەرچی هەیە ئەگەر ئەکرێ من پێیان ڕائەگەیەنم.

پۆلیس(( دێت بەرەو لای گێلاس)): زۆر سوپاس وەڵا دەمێکە لە دەرگا ئەدەم، ئەم ئاگادارییەیان بۆ هاتووە، وا ئەیکەم بە دەرگاکەیانەوە. ئەگەر تۆش هەرچی زووترە بتوانی ئاگاداریان بکەیتەوە، زۆر باشترە.

گێلاس: ئاگاداریی چی؟ یائەڵڵا خێر؟

پۆلیس(( تورە)): چاوەڕوانی خێری چین دادەگیان؟..

# (( ئەڵقەی بیست و سێ))

تەواوکەری قسەی پۆلیس: دوو سبەی باوکەکەیان لە سێدارە ئەدرێ و داوای کردووە بیانبینێ.. بەڵام تۆ ئەوەیان پێ مەڵێ، با بێن بۆ بنکەی پۆلیس.

گێلاس (( غەمبار)): ئۆو کاک دارەوان، ئای خوایە چەند هەواڵێکی ناخۆشە.. جا من چۆن ئەتوانم پێیان بڵێم.. بەخوا قەت ئەوە ناکەم براکەم.

پۆلیس: جا خۆ من پێمنەوتی خێرت ئەگا پێیان بڵێی؟

گێلاس: نا براکەم ئەو خێرە ناکەم.. من ناونیشانی قاوەخانەی کچەکەیت ئەدەمێ، بیبەی بۆ ئەو باشترە.

پۆلیس: بێنە ئەو ناونیشانەم بەرێ، پێویستیش ناکا بیکەم بە دەرگاکەو تۆش بە من تێ ناگەیەنرێیت.. خۆشم سەرم لێ ئەشێوێ.

(( گێلاس لە میوتیداو بە ئامارە ناونیشان هەڵئەدات))

Cut

دیمەنی – ٤٧٠ – ڕ/ن – قاوەخانەی تریفە:

(( قاوەخانەکە کەسی تیا نییەو بەرەو داخستن ئەچێ، کرێکارەکان گڵۆپ ئەکوژێننەوە.. تیرۆژ سەری خستۆتە سەر مێزێک و زۆر ئەگری.. تریفە گریان و فرمێسکێکی زۆرو لێشاو، ڕوخساری تەڕە ))

تریفە: ئا ئا.. دایە گیان ئێستا پۆلیسێک هات ئاگاداریی بۆ هێناین، توخوا زوو بگەڕێنەوە با هەموو بیبینین.......... بەڵێ دوو سبەی............. سەعات چەند ئەگەن؟ ...................... ڕێک وەرن بۆ ماڵی ئێمە، ماڵی ئێوە کەڵکی نەماوە، هەڵشۆ ئەیوت وێرانیان کردووە............. باشە دێینە فرۆکەخانە بە شوێنتانا.............. باشە بەقوربانی ئامۆو ئاواش بم........................ با لێرە بن......... دەی خوا ئاگادارتان بێت. (( بۆ تیرۆژ)) هەستە تیرۆژ گیان با بڕۆینەوە خێرا.

تیرۆژ(( بە گریانەوە)): ئەی کاک هەڵشۆ سەیارەکەی تۆی نەبرد؟

تریفە: بە تەکسی ئەڕۆینەوە هەستە. (( بۆ کرێکارەکان)) ئێوەش هەمووتان پشوون مەیەنەوە تا چەند ڕۆژێکیتر خۆم ئاگادارتان ئەکەمەوە، باش دەرگاو پەنجەرە داخەن.

(( ڕۆشتنە دەرەوەی تریفەو تیرۆژ لەناو بەڵێ باشەی کرێکارەکاندا ))

دیمەنی – ٤٧١ – ڕ- عەسر/ د – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان و هاوڕێ دانیشتوون غەمبارن))

ئەردەڵان: جا ڕاستە؟

هاوڕێ: ئەرەوەڵا ئێستا نارەوەن خان لەو بنی دنیایەوە خەبەری زانیووەو بە کاک هەندرێنی وتووە.

ئەردەڵان: انا للە وانا الیە راجعون.. وەڵا ئیتر مەگەر شوو بکا بە کاک حەمەخدر!

هاوڕێ (( گرژ)): بەخوا بێ ئەقڵی هەتیو، ئێمە لە خەمی چیداین و تۆ باسی چی ئەکەی؟ جا مەرجە هەر ئەبێ مێردی هەبێ؟

ئەرەڵان: کورە تۆ هەر زۆر بێ ئەقڵتری لە من گەوجە.. من باسی ئەخیری فلیمەکەت بۆ ئەکەم.

هاوڕێ: کورە خوا بە هەق بناسە هەی گەمژە، کاک حەمەخدر بە کوڕی ئەشێ، شووی چی و تەڕەماشی چی؟.. وتویەتی بەیانی گۆڕێکی لە شوێنێکی باشەوە بۆ بکرن، وابێ سەرقەبرانەکەی ئاسان بێ و ڕێی سەیارەی هەبێ.. ئەبێ بەیانی بچی ئەوە بکەی نەک دانیشی ئەم قسە بێ مانایانە بکەی.

ئەردەڵان: هەرچیپەک پارەی تیانەبوو بۆ منی دانێن باشە؟ کەری خۆتان باش بەستۆتەوە.. ئەی خۆت بۆ ناچی؟

هاوڕێ: ئێمە شەوەکیی ئەبێ بچین بۆ فرۆکەخانە بۆ بەخێرهێنانەوەی نارەوەن خان و کاک حەمەخدرو کوڕەکانی.

ئەردەڵان: مادام شەوەکیی تێکەوت، قەبر کڕینەکە بدەن بە من، بەخوا هەر ناتوانم زوو هەستم.

هاوڕێ: خۆم ئەزانم چ ئیشێکت پێ ئەسپێرم، تۆ بلێی نەتناسم؟!

Cut

دیمەنی – ٤٧٢ – ش/ن – زیندان:

(( زوبێر جگەرە ئەکێشێ))

**زوبێر مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

لە گەنجێتیدا گاڵتەم بەو چیرۆکانە ئەهات پیاوە کامڵ و پیرەکان و ژنە بە ئەزمونەکان ئەیانگێڕایەوە.. دنیام زۆر لەوە پێ بچووکتر بوو، جێی ڕووداوی وا گەورەو سەرکێشییە بێ ئەقڵییەکان بکاتەوە.. تا زیاتر هەڵئەکشام، زۆرتر لەو دنیایە بە ئاگا هاتمەوە، کە هەموو گێڕانەوەیەک لە خۆی ئەگرێ و جێی هەموو حەسرەت و ئازارو کۆستەکانی تیا ئەبێتەوە.. ئەگەر ئەوکاتانە پێیان بوتمایە دارەوان ئاوا کۆتایی دێت، نەک هەر سەری دنیام لێ ئەهاتەوە یەک، بەڵکو دەستم ئەچووە ئەو کەسەش کە ئاوا بیر بکاتەوە.... کەچی دارەوان بۆ بەرژەوەندییەک، کە بە لەدەستدانی ژیانی خۆی کۆتایی پێهات، هەموو جوانییەکانی نێوانمانی لەدەستدا.. حەیف دارەوان.. ئاخر ئێستاش من باوەڕ بەوە ناکەم لەگەڵ من کردت..... بڕۆ ئۆغرت خێر برا هەمیشەییەکەم، من تەنها تۆم شک ئەبرد گرێیەکی دڵت لا بکەمەوە، تۆشم چووی (( پڕمەی گریان.. پاش کەمێک)) بەڵام دڵنیابە ئەبمە پشت و پەناو هێزی گەورە بۆ ماڵ و مناڵەکەت و ئەبەد من ناپاکییت لەگەڵ ناکەم.. من لەبری تۆ ئەیانپارێزم .....

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( گریان و ڕامان لە میوتیدا))

دیمەنی – ٤٧٣ – ش/ن – پێشوازی فرۆکەخانە:

(( هەڵشۆو تریفەو تیرۆژو هەندرێن و تافان و ڕیژوان و بروسک و سەلواو چیمەن و هاوڕێی چایچیی بە جلی سەرتاپا ڕەشەوە لە چاوەڕوانییدان و بە غەمبارییەوە دانیشتوون، بە بێ حوار.. پاش کەمێک نارەوەن و خدرو ئاواو ئامۆ بە جلی ڕەشەوە دێنە ژوورەوەو بە هاتنیان گریان دروست ئەبێت و نارەوەن و ئامۆو ئاواو تریفەو تیرۆژو تافان باوەش ئەکەن بە یەکداو کوڕەکانیش باوەش و ماچ گۆڕینەوە ))

نارەوەن: بەسیەتی، بەسە باری خوایەو ڕازین بەبەشی.

تیرۆژ (( گریان)): دایکە ئیتر باوکم نابینینەوە هەر بەیانییەو ئیتر تەواو.

تریفە(( گریان)): ناتوانم بیهێنمە بەرچاوی خۆم باوکم لە ژیانا نەبێ.

نارەوەن: بەسیەتی کچم، با خەڵکمان لێ کۆنەبێتەوە.. ئەچینەوە بۆ ماڵەوەو لەوێ چی ئەکەن بیکەن.

هاوڕێ: وایە لەوێ شینی خۆتان دابەستن دادەگیان.

ڕێژوان: فەرموون فەرموون، سەیارەکان ئامادەن.

(( نارەوەن پێشیان ئەکەوێت و هەموو فەرموو فەرموو یەکتر پێش ئەدەن))

Cut

دیمەنی – ٤٧٤ – ڕ/ د – دوکانی لەنگەکە:

(( شامورا‌د دانیشتووە لەسەر کورسیی و شاخەو ئدریسیش بە پێوە ))

شامورا‌د: ئەمشەو دەرچوونێکتان هەیەو بەیانی و دوو بەیانیش بە هەمان شێوە.

شاخە: بۆ کوێ گەورەم؟

شامورا‌د: پێش ئەوەی بپرسی بۆ کوێ، زۆر دڵنیابن ئەم سێ ئیشە بچوکترین هەڵەی تیابکرێ، گەر دەستمان بە پەڵەی هەوریشەوە بێت، پاشا هەرسێکمان فت ئەکا.

ئدریس: دەی کەواتە با ورد تێبگەین.

شامورا‌د: ئافەرین ئدریس، ئەبێ ورد تێبگەن.

شاخە: ئەرەوەڵا ئەمە ئیشی مان و نەمانە، مەجالی هەڵەی تیا نییە.

شامورا‌د: هەر ئەوی ئەمشەو ئەزانم، ئەوانیتر خەلیلی لای پاشا خۆی دێت و یەک یەک پێتان ئەڵێ، ئەمشەو ئەچنە سەر ماڵی دەوڵەمەندێک داوای ئەو پارەیەی لێ ئەکەن کە پاشا ئەمری کردووە وەک سەرانە لێی وەربگیرێ.. ئەگەر یەکسەر پارەکەی دا، ئەوە خێری پێوەیەو گەر نەیشیدا، ئەیکوژن.. لە هەردوو حاڵەتدا ئەوە سەرکەوتننتانە.. لەوە بترازێ، ئیتر ئەبێتە مەترسیی بۆ سەر ژیانی هەرسێکمان.. جا باش تێبگەن.

شاخە: ئاخر نابێ بزانین ماڵەکەی کامێرای هەیە؟ نییەتی؟ لە نزیک بارەگاو شتەوەیە؟ یا چۆڵەوانیی؟ پاسەوانی هەیە؟ یان نا؟ ئەمانە هەموو قسەن.

شامورا‌د: لە هەمووی بێخەمبن، وەک هێلکە پاک کراوە.

ئدریس: کابرا کێیەو ماڵی لە کوێیە؟

شاخە: ئەی سەرانەکە چەندە؟

(( لە میوتیدا دایالۆگ و سەرسامیی دەربڕین ))

Cut

دیمەنی – ٤٧٥ –ڕ– بەیانییەکەی/ د – بەردەرگای زیندان:

(( خدر لەبەردەرگای بە بێتاقەتیی وەستاوە.. پاش کەمێک، نارەوەن و ئامۆو ئاواو تریفەو تیرۆژو هەڵشۆ، دێنە دەرەوە.. نارەوەن و ئاواو ئامۆو هەڵشۆ، وەک خۆڕاگر دەرئەکەون و تریفەو تیرۆژ گریانی زۆر))

خدر(( غەمبارو دەنگی کز)): بینیتان؟

نارەوەن: شەڵڵا هەر نەمانبینیایە، ئێستا بوو بە کۆستی گەورە، وا نەمانبینیایە نەمانئەزانی لە چ وەزعێکایە(( ئەگری))

خدر: ئارام بگرن، سەبووریی خۆتان بدەنەوە، دەسەلات نییە.

هەڵشۆ(( ڕق لێبوون)): ئەوە تۆ باوکت لە سێدارە بدرێ ئارام ئەگری؟

خدر(( ئاوڕێکی بۆ ئەداتەوەو بۆ ئەوانیتر)): فەرموون سەرکەون بابڕۆین.. (( بۆ هەڵشۆ)) بابە گیان تۆ سەیارەکەی تریفە لێخوڕە، با خۆی و تیرۆژ لای تۆ سوار بن، بە هێمنی لێیخوڕە، جرت و فرت نەکەی.

هەڵشۆ(( پیش خواردنەوە)): ئامۆژگاریی من مەکە خۆت جوان لێخوڕە.

(( سورای سەیارەکان ئەبن))

Cut

دیمەنی – ٤٧٦ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی دارەوان:

Mute

((هاوڕێ، بروسک و ڕێژوان و هەندرێن، لە چاوەڕوانیی ئەواندان و دیالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٤٧٧ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس بەجلی ڕەشەوە لە حەوشەوە سەری دەرەوە ئەدات، ئاکۆ بە چاکەت و بیجامەی لەبەرە، لەناو دەرگای ژوورەوە بانگی ئەکا ))

ئاکۆ: ئەو هەموو سەرەتاتکێیە جوان نییە، یا بچۆ ئەوبەرەوە، یا گوێ هەڵخە بۆ دەنگی سەیارەکان و کە هاتنەوە بچۆ بەرەوپیریان.

گێلاس: ئەوبەر هەر پیاوی لێیەو لە حەوشەکەیا وەستاون، بچم بۆ لای کێ؟ ئاوا جاروبار سەرێکی دەرەوە ئەدەم با زووتر ئاگام لێ بێ.

ئاکۆ: ئاخر ئێستا خەڵک ناڵێن ئەو ژنە ئەو هەموو سەرەتاتکێیەی لە چی؟

گێلاس (( سەرێکی تری دەرەوە ئەدات )): مەگەر تۆ وابڵێی، ئەگینا کەس وا ناڵێ، کوا من لە ڕێکی ئەوەدا ماوم؟ (( بە هەڵپە )) وا هاتنەوە من ئەڕۆم، دوایی تۆش بێی.

(( گێلاس بە فڕکان ئەچێتە دەرەوە ))

Cut ——— تابع

دیمەنی – ٤٧٨ – متبوع – ڕ/ د – بەردەرگایماڵی نارەوەن:

Mute

(( یان ئەکرێ دیالۆگی کورت و ئاسایی تایبەت بە گەڕانەوەی کۆمەڵەکەی ناو سەیارەکان بۆ لای دارەوان هەبێت و فەرموو کردن بۆ ژوورەوەو دڵڕاگرتنی نارەوەن و مناڵەکانی))

(( بەردەرگای ماڵەکە هەندرێن و هاوڕێ و ئەردەڵان و بروسک و ڕێژوان و ديارو سێ پیاویتری لێیە.. نارەوەن و تریفەو تیرۆژو هەڵشۆو ئامۆو ئاوا دائەبەزن و بەرەو لای ئەوانی بەر دەرگا ئەچن.. گێلاس بە خێرایی بەرەو نارەوەن و کچەکان ئەچێت و ماچیان ئەکات.. هەموو جلیان ڕەشە، غەمبارن، بەرەو ژوورەوە ئەچن))

Cut

دیمەنی – ٤٧٩ – ڕ/ن – زیندان:

(( دارەوان سەری خستۆتە ناو هەردوو لەپی.. دواتر سەر هەڵئەبڕێ))

<u>**دارەوان مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**</u>

هەهە سبەی لە سێدارەدانە و منیش هەر ئەڵێی هەزارساڵیتر ئەژیم.. ناتوانم باوەڕ بەوە بێنم کە سبەینێ ئەیبینم.. ئاسانا مناڵ و کەس و کارو دۆستان، باوەڕی پێ بێنن و لە ئێستاوە شین بگێڕن، بەڵام من نا.. نازانم بۆ بیر لە نەمریی ئەکەمەوە؟ تۆ بڵێی هەمووان وا بن؟ ناتوانم وا بزانم منیش وەک ئەوانیتر لە بڵقێک ئاو زیاتر نەبووم.. ئاخر ئەمە منم، جیهان و هەموو شتەکانیتر ئەبینم، ئەگەر من نەمێنم هەموو هەبووەکانیش بایەخیان نامێنێ.. هەهەه من چۆن ئەمرم؟

دارەوان: هەهە مردنی چی؟ چۆن هەروا بە ئاسانیی لە ژیان ئەکرێمە دەرەوە؟ جارێ زۆرم ماوە، ئۆووو هەر زۆر زۆر.. من زۆرێک لە دەرفەتەکانم لە دەستدا، نەمئەزانی ئاوا ئەڕۆم.. قەت بیرم لەوە نەکردۆتەوە بە ئێستەشەوە، کە من تەنها یەکجار بۆم هەیە بژیم و جارێکیتر خەونیشم نامێنێ تا خەوی پێوە ببینم.. ئۆو خەریکە قورس ئەبێ.. بەڵام ئەوانیش خۆیان ئامادە کردووە سبەینێ زوو، ئیشەکەی خۆیان ڕایی بکەن... هەهە بە وەزیفەی جەللادەکان من لە ژیان ئەکرێمە دەرەوە (( پێکەنین بە دەنگی بەرز)) یەعنی ڕێک وەک مریشک فرۆشەکەی ناوبازاڕ، سەربڕین و ڕایی کردنی ئیش.. (( بە دەنگی بەرز پێکەنین)) یەعنی من مریشکەکەی لای کابرام هەهەه وایە مریشک ژەمێک تێر ئەکا.. ئەی من؟ منیش هەندێ مارو مێروو تێر ئەکەم (( پێکەنین)) کەواتە هەردووکمان ژەمە خۆراک دەرچووین هەهەه ئەی بۆ نەڵێم بڵقی ئاوەکە بووین هەهەه ئای خوایە دنیا چەند سەیرە، ئەی کوا بیرکردنەوەو تێکۆشان و هەوڵەکانم.. خۆ هەموو بوون بە بڵقەکە، ئای تەنها حەسرەتی ساتە لەدەستچووەکانم گەورەیە.. کەواتە هەر بەیانی زوو من و هەزاران مریشک لە ژیان ئەکرێینە دەرەوەو ئەبین بە ژەمە خۆراک، من و هەزاران مێرولەو ئاژەڵی قەسابخانەکان و زیندەوەری ژێر پێیە قورسەکان (( پێکەنینی هیستیریی)) <u>**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو**</u>:

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٤٨٠ – ش/ن – ماڵی بروسک:

(( بروسک بە مۆبایل.. چیمەن دێتە هۆڵەکەوە))

بروسک: وابزانم سەعات هەشت و نیو بۆ نۆ وەرئەگیرێتەوە.. لەگەڵ ئامۆش قسەم کرد.. ئەگەر لە شەشەوە لە ماڵی ئەوان بین باشە. وائەزانم سەعات پێنج سێدارەکە جێبەجێ ئەکرێ.

ڕیژوان (( دەنگ)): زۆر باشە، من و سەلوا لە شەش لەوێ ئەبین.. بەس بەخوا دایکم ناتوانێ بێ.

بروسک: نەبابە دایکتی چی؟ کێ گلەیی لەو ئەکا؟ داماوە هەر ناتوانێ بە پێوە بوەستێ.. هەر خۆت و سەلوا بەسە.

ڕیژوان: وا ئەکەم بروسک گیان زۆر باشە.. تا سبەی ئەتبینم. بای جارێ.

بروسک: بای .... (( مۆبایل هەڵئەگرێتەوە.. بۆ چیمەن)) داماوە ئەوەندە ڕووگیرە بە نیازبووە دایکیشت بێنێ.

چیمەن: کورە هەر زۆر ڕووگیرە، نازانم ئەم ژنەی چۆن هێنا؟ هههه

بروسک: ئیتر ژیان ئاوایە چیمەن گیان.. هەموو شتێک شیاوی ئەوەیە بە ئەقڵدا بێت.. لە باوەڕی کێدا بوو باوکت و کاک دارەوان ئەوەیان بەسەر بێت.. هەر زۆر سەیرە، وەک باوکت باسی ئەکا، دوو هاوڕێ بوون، تەنها خۆشەویستیی پێکەوەی بەستبوونەوە، کەچی لە کۆتاییدا بیر لە کوشتنی کچی یەکتر بکەنەوە.

چیمەن: بەردەوام خەڵک لە گۆڕاندایە بروسک.. من لەو بڕوایەدام، هەر خۆشەویستیی نەبووە، بەڵکو بەرژەوەندیی شاراوەشیان پێکەوە هەبووبێت.. بۆ نمونە هەر هیچ نەبێ، هەریەکەیان ئەویتری بە پشتی خۆی زانی بێت.

بروسک: واو چەند جوانە ئەو قسانەت، سەر باوکتت داوە.

چیمەن: ئەی چۆن شتێکی هەر لێوە فێر بووم.

بروسک: باوکت ئەمڕۆ تەلەفونی بۆ کردم، تەواو بێتاقەت بوو.. بۆی ئەگریا، داوای کرد جێیان نەهێڵین و لەگەڵیانا بین، تا هێمن ئەبنەوە.

چیمەن: ئای میانەیان زۆر خۆش بوو، ئیتر وەک یەکێ بڵێ هاوڕێی منالّیی، ڕێک هاوڕێی منالّیی بوون.. ئەی توخوا وەزعی چۆن بوو؟

بروسک: زۆر دڵیمدایەوەو پێموت چی پێویستەو پێویست نییە.. هەر دڵی لای دارەوان بوو، ئەیوت تەنها بیر لەو ساتەی ئەکەمەوە کە لە سێدارە ئەدرێ و لەبەردەم قەنارەکەدایە، ئەبێ لە چ حاڵەتێکدا بێت؟ ئەیوت بیرکردنەوەم لەوساتەی کوشتوومی.

چیمەن: زوو بیگەینێ و هەوڵ بدەین بیری ببەینەوە.. باوکم زۆر تەنیایە بروسک!

بروسک: بەڵام پیاوێکی واقیعییە، ڕەنگە هەر سبەی ئارام ببێتەوەو باش ببێت، کە بزانێ کار لە کار ترازاوە.

((لە میوتیدا دیالۆگی کورت))

Cut

دیمەنی – ٤٨١ – ڕ/ د – گۆڕستان:

(( نزیکی سەعات ١٠ لەسەر گۆڕێکی نزیکی جادەو ڕێی سەیارە..

ئامادە بووان لەسەر گۆڕەکە، کە شیوەن ئەکەن و باوکە ڕۆیانە: نارەوەن، تریفە، تیرۆژ، ئامۆ، ئاوا،ـــــ هەڵشۆو ڕێژوان ئامۆو ئاوا هێور ئەکەنەوەو گێلاس و تافان و سەلواو سۆماو بێستان دوو کچ و ژنیتر ژنەکان هێور ئەکەنەوەو هەڵیانئەسێنن.

لە دواشەوە: چیمەن و حەمەخدرو هاوڕێ و ئەردەڵان و هەندرێن و ئاکۆ بە دەستی پێچراوی لە مل کراوەوەو دیارو چەند گەنج و پیرێکیتر وەستاون وەک خزمان.

دەنگی شیوەن و دڵدانەوە ئەبیسرێت))

Cut

دیمەنی – ٤٨٢ – ڕ/ن – ماڵی تایەر/ ژووری تایەر:

(( تایەرو باوکی و ئاکار دانیشتوون))

تایەر: بەڵێ ئیتر وەک وتم وا ئەکەم باوکە.

باوک: چۆن کوڕی خۆم؟ خۆ تۆ شارەزای ئیشەکە نیت.. ئەوە هەر نابێ.. هەر ئەبێ خۆم لەگەڵتابم.

تایەر: ئینجا ئیش چییە خۆ تەیارە نییە؟ بە یەک دوو ڕۆژ فێر ئەبم.. نامەوێ تۆ بە دەمی پڕ لە خوێنەوە ئیش بکەی، ئەی منت بۆچییە؟.. بێ ئیش و بێکار هەر ئەسوڕێمەوە.

ئاکار: وا نابێ تایەر، با باوکت ئەو یەک دوو ڕۆژە، کورە تۆ بڵێ هەفتەیەکیش لەگەڵتا بێ تا تەواو شارەزای ئیشەکە ئەبیت و ئەوسا پێ دابڕێ.

تایەر: ئێ باشە باوە.. دوو ڕۆژ لەگەڵمابە.

باوک: خوا کەریمە با بزانین چۆن ئەبێ! (( هەڵئەسێ)) ئەچم سەرێکی دایکت ئەدەم، هەر خوا بکا نەمرێ باشە، بەخوا وەزعی زۆر شڕە.

تایەر: ئێستا لای بووم، کەمێ قسەم بۆ کرد گوێی لێگرتم.

باوك: دە باشە با منیش بچم.. ئێوە بۆ خۆتان دانیشن.

(( ڕۆشتنی باوک و کەمێک لەبەر هەستان..))

ئاکار: بەخوا گوناحە، بەم دوو سێ ڕۆژە چی لێهاتووە ئەو پیاوە.. ناهەقی نییە جەرگبڕان زەحمەتە، مەگەر هەر خوا سەبوری با.

برزو (( لە پڕا خۆی ئەکا بە ژووراو بە هەناسەبڕکێ)): شتم دەسکەوت تایەر!

(( تایەرو ئاکار لە شوێنی خۆیان ڕاست ئەبنەوە))

تایەر: ئادەی بەقوربانت بم، ئادەی!

برزو: هاوکاری پووره ڕەعنای خۆمان؟

تایەر: ئەوی سەر سوچی کۆلانی لای مەکتەبەکە؟ ئەوەی هەر لێرە بوو ئەم ڕۆژانە؟

برزو: ئا ئا. ئەو ئەڵێم.

ئاکار: دە خێرا قسە بکە مردووتمرێ چیت زانیوە.

برزو: ئەم بەیانییە زوو ئەچووم بۆ سەرئیش و ئەویش هات و پێکەوە سوار پاص بووین.

تایەر: ئێ باشە، دەی!

برزو: ئیتر لە ناو پاصەکە باسی ماڵی ئێوەو تەعزێکە کرا، نازانم ئەزانی یان نا؟ ئەو دەسگێڕی چایە لە گوزەرەکەی سەرجادە پانە دوو سایدییەکە.

تایەر: نازانم.

برزو: جادەکە نازانی؟

تایەر(( بێ حەوسەڵە)): با برزو جادەکە ئەزانم، نازانم هاوکار ئیشی چییە، ئەوە ئەڵێم، قسەکەت تەواوکە.

برزو: ئێ وەلحاسڵ ئەوە ئیشەکەیەتی.. وتی ڕۆژێک پێش ئەوەی ڕەحمەتی وای لێ بێت، من لە دوکانی لەنگە گەورەکە بینیومەو چام داوەتێ و لێم پرسیوە ئەوە چی ئەکەی لێرە کاکەزایەر؟ وتویەتی لێرە ئیش ئەکەم.

تایەر: ئەی بۆ چەند ڕۆژە قسەی نەکردووە؟

برزو: وتی هەر بموتایە هەڵیان ئەکوتایە سەر کابرا دڵ گەرم بوون، ئێستا باشترە قسە بکەم.

تایەر (( ئەیەوێ بچێتە دەرەوە)): بابڕۆین!

ئاکار: ئیش بە هەڵەشەیی مەکە تایەر(( نەهێڵێ هەستێت))، بوەستە ڕێگەیەکی باشی بۆ دابنێین.

تایەر: ڕێگەو مێگەی چی ئاکار؟ حەتمەن ئەوان کوشتویانەو ئەچین لە خوێنی خۆیانا ئەیانگەوزێنین.

ئاکار: براکەم ئەوە هەڵەیە، نابێ وا بکەین..سەبر بگرە با جوان لێی بکۆڵینەوە.

برزو: کورە بوەستە با قسەکەم تەواوکەم، ئیش چۆن وا ئەکرێ؟ ئەوە هەر زۆر منالأنەیە.

ئاکار ((تایەر ئەگێڕێتەوە)): تۆ بوەستە تایەر.. با بزانین چیتر هەیە؟

برزو: وەڵا ئیتر کە لەئیش بوومەوە.. چووم بۆ سەیری دوکانەکە، ئێوە بڵێن کێم لەوێ بینی ئیشی ئەکرد؟

تایەر: کێ؟

برزو: شاخەی پوورە ئەڵماس.

تایەر: چیییییییییی؟ شاخە چی ئەکرد لەوێ؟

برزو: نازانم، بەس وا دیارە شاخە ڕەحمەتی بردبێتە ئەوێ.

ئاکار: هەڵەشەیی ناوێ حەمەتایەر.. تۆ گوێ بگرە.. ڕاستە لەوانەیە شاخە ڕەحمەتیی بردبێتە ئەوێ.. بەس خۆ لەوێ نەکوژراوە، تا بڵێین ئەوان کوشتوویانە.. ئەوسا ئەتوانین بە شێنەیی لە شاخەی دەربێنین، لەوانەیە بزانێ بۆ چی ئەو شەوە ڕەحمەتیی لەو کۆڵانەیا بووە؟ ئەگەر زانی ئەوە ئەو کاتە سەرەداوێکمان دەستکەوتووە نەک لە هەر شوێنێک ئیشی کردبێ، ئیتر مانای وایە ئەوان کوشتبێتیان.. هەموو ئەزانین ماتۆڕسوارێک کوشتوویەتی، با شاخە ئێمە بگەیەنێتە ئەو ماتۆڕسوارە.

برزو: ئەی وایە.. با بزانین جارێ بۆچی شاخە بردوێتییە ئەوێ؟

تایەر: بابە شاخە ئەوە چەند ساڵە هەر لە خەڵک یاخییەو زەلام نەماوە ئەم هەتیوە دەستی نەبڕیبێ و دزیی لێ نەکردبێ.. چۆن کاکم دوای قسەی ئەو کەوتووە؟ نازانم.

ئاکار: هەموو شتێک تێئەگەین، تەنها بە سەبرو تەحەمول (( بۆ برزو)) خۆتۆ خۆت لێ ئاشکرا نەکرد برزو؟

برزو: نەوەڵا، هیچ خۆم پێ نیشان نەدا.

Cut

دیمەنی – ٤٨٣ – ش/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو گێلاس ماندوێتیی دەرئەبڕێ، دەست بە قاچیدا ئەهێنێ وەک شێلان))

ئاکۆ: قەینا دراوسێیە، ئەجری دراوسێتیی گرانە.. ئیشکردن و ماندوێتییەکەت جێی خۆی ئەگرێ.

گێلاس: ئەی حەددیان نەبێ ئیشیان بۆ بکەم، خۆ من منالّی نۆفیلکە نیم هەڵسوڕێم.

ئاکۆ: ئەی ئەم هەموو هیلاکییەت لە چی؟

گێلاس: ئەی هەر لە بەیانیی زووەوە تا ئێستا من یا بەپێوە بووم یان دانیشتنیتووم لەسەر کورسی، ئیشەڵڵا هیلاکیش نەبم؟ ئەی بۆ خۆت سەعاتێ ئەچیتە لای فیتەر ئەڵێی دانیشتن بەدیار فیتەرەوە لە یەک هەفتە کرێکاریی ناخۆشترە.

ئاکۆ: هههه ژنەکە فیتەرو تەعزێ ئەرزو ئاسمانی فەرقە. خۆمنیش هەر کەموکورت لەوێ بووم.

گێلاس: ئافەرییین (( خاوکردنەوە)) کام و کوووورت...

ئاکۆ: دەباشە گێلاس گیان بچۆ ئیسراحەت بکەو بخەوە.. بەیانیش ئەبێ لایان بی.

گێلاس: وەڵا هیچ نابێ لایان بم.. دووجار ئەچم لە بەیانی و عەسرەکەیاو هەر جارەی سەعاتێک دائەنیشم.. ئەگەر مەسەلە ئەرکی دراوسێتیی بێ، بەزیادەوە جێبەجێم کردووە.

ئاکۆ: دەی باشە تۆ ئێستا ماندووی، بەیانیی بەدڵی خۆت بکە.

(( بە ماندووێتییەوە هەڵئەسێت و ئەچێتە ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ٤٨٤ – ش/ن –ماڵی خدر:

(( حەمە خدر بە جلی ماڵەوە لەسەر سیسەم ڕاکشاوە، هەردوو دەستی خستۆتە پشتە سەری و چاوی بڕیوەتە بنمیچ))

**خدر مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

ئەگاتە کوێ؟ ئەمە ئەو پرسیارە جەوهەرییەی منە، کە نەمزانیووە چۆن لە خۆمی بکەم.. وەک هەر لەوەڕگەیەک سەیری شوێن و ژیان ئەکەم، بێ ئەوەی هیچم لە خۆم پرسیبێتەوە، بە کوێ ئەگەم؟........ لە کۆتاییشدا وەک دارەوانی ئەمرۆ، بەرەو ناو گۆڕەکە شۆڕ ئەکرێینەوە.. تۆ بڵێی مردن ئەو پشووە ڕاستەقینەییە بێت کە بەدواییدا ئەگەڕێین؟ هەرچییەک بێت گرنگ نییە، گرنگتر ئەوەیە سبەی چۆن بەو جۆرە داڕێژم، کە کەڵەکە دیواری داهاتووی لەسەر هەڵچنم.. ئەبێ ئیتر بیرێکیش لە خۆم بکەمەوە .......... منی تەنیای دابڕاو لە هەموو گەردوون، لە باوک و خوشک دابڕاو لە هەموو شتەکان، بەڵام ئیتر ئەبێ کۆمەڵایەتیش بم.. دەی ئیتر ئەبێ بەتەنگ تەنیاییەکەی خۆمەوە بێم و پێخۆرێکی ئاسان نەبم.

مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:

خدر: ئەی وایە تا بارانە ئیش بکەم، نەک دواتر بۆ بەختەبارانێ دوعاو نزا بکەم و بپاڕێمەوە.

(( ئەخەوێت))

Cut

دیمەنی – ٤٨٥ – ڕ/ د – سەرەتای شەقامێکی کەمێک پان:

(( تایەرو هاوکار بە تەرمۆزەو سینییەک پیاڵەوە.. ئاکارو شەماڵ وەستاون))

تایەر: هیچیتری نەوت؟

هاوکار: بەڵێ.. وتی هەرکاتێک بە ئێرەیا تێپەڕیت، چا خەستەکەی منت بیر نەچێ. زۆر دڵی بەم ئیشەی خۆش بوو.. بەس کاک حەمەتایەر شاخە زۆر گۆڕاوە، کە دێتە بەر دەرگاکە پیاو لێی ئەترسێ، هەر لەخۆیەوە، مۆڕە لە داروبەرد ئەکا.

شەماڵ: هیچ نییە فشەکەرە هەروا بووە، چاوی بە پیاوی خۆی بکەوێ ئەتۆقێ.

هاوکار: ئەی توخوا چۆنە برزوتان لەگەڵ نییە؟

ئاکار: کورە ئەوەنە چەنەبازو ناحاڵییە، هەموو شتێک ئەشێوێنێ.

هاوکار: بەس بەخوا ئازایە.

تایەر(( اهمال کردن)): وایە ئازایە.. ئێستا تۆ بچۆ بەلای ئیشەکەی خۆتەوەو ئێمەش بەرەو ئەوێ ئەچین.. تۆ مەیە ئەوناوە.

هاوکار: بەڵێ باش.

(( بەرەو ڕیزە دوکانەکە ئەچن))

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٤٨٦ – متبوع – ڕ/ د – بەردوکانی لەنگەکە:

(( شاخەو ئدریس سەرقاڵی جل ڕێکخستنن.. تایەرو ئاکارو شەماڵ ئەگەنە بەر دوکانەکە))

تایەر(( بێتاقەت)): ئا شاخە تا ئێرە وەرە!

شاخە(( سەر بەرز ئەکاتەوەو ئەیبینێ، شڵەژان و بە پەلە بەرەو ڕوویان دێت)): ئۆو کاکە تایەر گیان بەخێر بێی یاخوا براکەم باشیت؟

تایەر: تۆزێک ئیشم پێتە وەرە دەرەوە.

ئدریس: ئەوانە کێن شاخە؟

شاخە: براو خزمی خۆمن، برای کاکە زایەری ڕەحمەتییە.

(( ئدریسیش دێت و شاخەو ئدریس پۆزش ئەهێننەوە بۆ نەچوونیان بۆ تەعزێکە بە هۆی ئیشەوەو سەرەخۆشیی ئەکەن و بەخێرهاتن و فەرموو کردن))

شاخە: تۆ خەریکی چاککردنی جلەکان بە ئدریس، ئێستا دێمەوە، کەمێ ئیشمان هەیە.

(( دێنە لایەکی دوکانەکەوە))

شاخە: ئەی بۆ نایەنە ژوورەوە چایەک ساردییەکتان بۆ بانگکەم.. ئەی توخوا نانتان خواردووە؟ با نانێک بانگکەم!

شەماڵ: نانی چ وەختییە؟

ئاکار: بۆوا شڵەژاوی شاخە؟

شاخە: شڵەژانی چی؟ بۆ هیچ بووە؟

تایەر: شاخە تۆ کاکەمت هەڵفریواندووە، لێرە ئیش بکا.. هەموو خۆت و ئیشە قەڵبەکانیشت باش ئەناسین.

شاخە: بەخوا من دەستم لە هەموو ئیشێکی خراپ هەڵگرتووەو بۆیە لێرە ئیش ئەکەم تا کەس ناوم نەهێنێ و بە حەڵاڵیی پارە پەیاکەم.. ئینجا خۆ کاکی ڕەحمەتیشت لێرە ئیشی پیاوانەی کردووە، خۆ ئێرە جێی دزیی و فرتوفێڵەکانی من و ئەوی تیا نابێتەوە، ئیشێکی شەریفانەیە.

تایەر: من لە ئیشە خراپەکانی کاکیشم ڕازی نەبووم، کە هەزار شتی قۆڕتان پێکەوە کردووە.. دڵنیام دوور کەوتنەوەی لە باوکم و هاتنی بۆ لای تۆ، بۆ تێهەڵچوونەوەی ئەو ئیشانە بووە.

شاخە(( ترس و خەندەو ڕیایی)): جا کاکە حەمەتایەر، ئیشی خراپ چی ئەکا لە دوکانێکی ئاوایا؟ تۆ هەر لە خۆتەوە تاوانبارمان مەکە.

تایەر(( صارم)): ڕاستم پێ بڵێ شاخە! کاکم چی ئەکرد بەو نیوەشەوە لەو گەڕەکەیا؟ لەو گەڕەکەیا ماڵی دەوڵەمەندێک بڕاوەو کاکیشم لەو شوێنەیا کوژراوە.

شاخە: ئینجا من حەقم چییە بەسەر کاکتەوە بۆ هەر شتێک چۆتە ئەو کۆڵانەوە؟ ئەو بە ڕۆژ لەگەڵ من ئیشی کردووە، نەک شەو.

تایەر: شاخە ڕاستم پێ بڵێ، هیچ ڕوونادات.. ئەو شەوە تۆ ماتۆڕت پێ بوو؟

شاخە (( ترساو)): نەبەخوا لە ماتۆڕ هەر نازانم.

تایەر: تۆو کاکم و ئەو هەتیوە چاوزەقە چوونە سەر ماڵەکە؟ یان یەکێکیتان ماتۆڕسوارەکە بوون؟

شاخە: نە بەزاتی خوا هیچ ئاگامان لە ماتۆڕسوار نییەو هەر ناشزانم باسی چی ئەکەی.

ئاکار: شاخە ئەزانی زۆر باشت ئەناسین.. خۆت گێل و نەبان نیشان مەدە، بە زاتێ زاتی خوایە، ڕاستیمان پێ نەڵێی، بە بکوژەکەت ئەزانین و ناودەمت پڕ ئەکەین لە فیشەک.

شاخە: بۆ خاتری خوا، ئێوە باسی چی ئەکەن؟ زایەر وەک برام وابوو چۆن دەستم تێی ئەچێ؟

شەماڵ: کەواتە ڕاستییەکە بڵێ و با ئاگرەکە لە تۆ دووربێ.

شاخە: وەڵڵاهی بەس ئەوەنە پێموت بێتە ئیرە ئیش بکات و ئیتر بە هیچ جۆرێک ئاگام لە کوژرانی نییە.

تایەر: کەیفی خۆتە.. با ئەوە پۆلیس ساغی بکاتەوە، تۆ کوشتووتە یان نا.. من بڕیارمداوە خۆم هیچ شتێک لە بکوژی براکەم نەکەم و تەسلیمی پۆلیسی بکەم.. ناچارم شکاتەکە بکەم و ئەوسا کە پەنجەمۆرەکەت دەرکەوت بە شتەکانی ماڵەکەوە، دەرئەکەوێ هەرکەس دزییەکەی کردبێ و هەر ئەویشە کوشتوویەتی.

(( شاخە بیرکردنەوەو ڕامان))

شەماڵ: چی بوو ورتەت بڕا؟! ئەوە بۆ نقەت نەما؟

تایەر: ڕاستیەکە بڵێ پێش ئەوەی بە پۆلیس بڵێم دزەکەو بکوژی براکەمم دۆزیوەتەوە.

شاخە(( قەلەق)): بە قەبری باوکم، بەزاتی خوا حەمەتایەر، بزانم کێ کوشتوویەتی، لە پێش تۆیا، خۆم هەموو گیانی ئەکەم بە بێژنگ.. هەر ئاگاشم لێ نەبوو کوژراوە، بەزات و سیفەتی خوا. بەڵام بە پۆلیس مەڵێ، تا ئێستا لای پۆلیسیش ڕوون نییە ئەو لە دزیەکەیا بەشدار بووە یان نا.. توخوا با ناوی نەزڕێ.

تایەر: کەواتە قسەکەی منە، پێکەوە چوون بۆ دزیەکەو ناتەوێ سومعەی کاکم خراپ بێ و تۆش بخرێیتە زیندانەوە.

شاخە: هەر بە ناوهێنان و پەنجە مۆری من و ئدریس هەموو شتێک دەرئەکەوێ.. من ڕاستیەکەت پێ ئەڵێم حەمەتایەر.. هەفتەیەک پێش ڕووداوەکە کاکت بێرەدا تێپەڕی.

**بۆ - فلاشباک –:**

______ گەڕانەوەی هەیە ______________ Cut ____________

دیمەنی – ٤٨٧ – فلاشباک – ڕ/ د - بەردەم دوکانی لەنگە:

(( شاخەو ئدریس بە جلی کوردی و کڵاشەوە لەبەر دوکان وەستاون و زایەر بەوێدا تێپەڕ ئەبێ.. پاش ئەملاولا ماچ کردن و سڵاوی گەرم و پێکەنین و بە یەکتر ناساندنیان لەگەڵ ئدریس، ئدریس ئەچێتە ژوورەوە ))

زایەر: ئەوە چی ئەکەی لێرە؟ سەیرەبێ خەریکی کاسبی بیت؟

شاخە: خۆت بێ ئەقڵ مەکە، کەی من و تۆ بە ژیانمان کاسبیمان زانیووە؟

زایەر: وەڵا وا سێ چوار مانگە باوکم بەدوای خۆیا ڕامئەکێشێ خەریکە ئەو دڵەم ئەتەقێ.

شاخە: کورە من و تۆ هەر ئیشە قۆڕەکەی خۆمان شارەزاین، نەوەڵا کاسبی نازانین.

زیەر: ئەی لێرە چۆن دەستت ئەکەوێ؟

شاخە: ئۆو کورە خێر لێرەیە.

زایەر: چۆن؟

شاخە: من لێرە تەنها دزیی کردنەکەم لەسەرە، ئیتر دۆزینەوەی شوێنی دزیەکەو ڕێوجێگەی هەمووی خەڵکی لە پشتەوەیە.

زایەر: یەعنی تۆ سۆراخی پارەدارەکان ناکەی؟

شاخە: نە باووووە!!! من حازر خۆرەکەم.. شتی وا ئەدۆزنەوە، خێرەکەی لە ئەقڵی من و تۆیا نییە، بەشێکی ئەدەن بە من و ئەو باقییەکەی هەمووی بۆ خۆیانە.. بەخوا دزیی لە بەشەکەی ئەوانیشا ئەکەم، ئەی خۆ نازانن چەندم دزیوە.

زایەر(( پێکەنین )): ئەی من ئەتوانم بێمە لای ئێوە ئیش بکەم؟

شاخە: وەڵڵاهی زایەر گیان ئەبێ پرس بکەم، لە خۆمەوە ناتوانم وەعدت بەمێ.

زایەر: جا پرسەکە زۆری پێ ئەچێ؟

شاخە: نا.. هەر بەیانی یان ئەوپەڕەکەی دوو بەیانی جوابت لێ ئەگێڕمەوە.

زایەر: وەڵا وەک تۆ ئەیڵێی زۆر چەورە.. هەر ئەمڕۆ کە باوکمم بینی، پێی ئەڵێم ئیشیترم دەسکەوتووەو ناتوانم لەگەڵتا بێم.

شاخە: نا نا جارێ پەلە مەکە.. با پرس بکەم و کە ڕازی بوون، ئەوسا هەر مەهێڵە باوکیشت ئیش بکا، کورە خێرەکەی لە ئەقڵا نییە زایەر.

**<u>فلاشباک تەواو</u>:**

Cut

دیمەنی – ٤٨٨ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٤٨٦ - :

شاخە: ئیتر هەر لەگەڵ بە گەورەمم وت.......

تایەر (( قسەی پێ ئەبڕێ)): گەورەت کێیە؟

شاخە: کاک شامورادە خاوەنی ئێرەیە، وا ئەزانم ئەویش ئیش بۆ کەسێکیتر ئەکا.

ئاکار: ئەو کێیە؟

شەماڵ: لەوانەیە ئەویش ئیش بۆ کەسێکیتر بکا.

شاخە: نازانم ئەو کێیە، هیچ شتێک بە ئێمە ناوترێ، تەنها شوێن و کاتی دزیکردنەکەمان پێ ئەڵێن.

تایەر: ئێ دوای ئەوە.

شاخە: گەورەم زۆری پێ خۆش بوو کە باوەڕ پێکراوی منەو دوای یەک دوو ڕۆژ قەناعەتی بە باوکت کردو هاتە ڕیزی ئێمەوە.

تایەر: ئەی چۆن ئەوماڵەتان دیاریکرد؟ ئەویش هەر گەورەت پێی وتی؟

شاخە: بەڵێ، کە گەورەم پێی وتین، زایەری ڕەحمەتیی لە هەردووکمان زیاتری پێخۆش بوو، وتی دەمێکە دزییم نەکردووە، هەموو عازای بەدەنم گەشایەوە کە ئەمشەو دەرئەچین.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤٨٩ – ڕ/ن - ژووری عەمید سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین و ڕاهۆز))

سەرکۆ: باشە.. کەواتە ناوچەکەی تۆ جموجوڵی تیایە، بەڵام ئەو چالاکیانە لە دەسەڵاتی پۆلیسدایە.. هەرکاتێ زانیارییەکانت کامڵ بوون و کەموکورتیی تیانەما، بینێرە بۆ پۆلیس با کارڕایی خۆیان بکەن.

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم.

سەرکۆ (( بۆ کۆژین)): ئەوە دەنگو باسی ناوچەی گەیم، ئەی دەنگوباسی ناوچەی بلاک؟

ڕاهۆز (( هەڵئەسێت)): هەر فەرمانێکت هەبێ گەورەم؟!

سەرکۆ: نا تۆ بڕۆ نەقیب ڕاهۆز. (( تحیةو چوونە دەرەوەی ڕاهۆز))

کۆژین: گەورەم هەموو شتێک ئاساییە.. چاودێریی نارەوەن بەردەوامەو خدر ئەمشەو وردەکاریی پرسەکەی بۆ نووسیوم.

سەرکۆ: ڕائید کۆژین، بە درێژایی ئەو ماوەیەی تۆ دابڕایت و ڕاپۆرتەکانمان لە نارەوەنەوە پێ ئەگەیشت، ئێمە ڕاپۆرتەکانمان بە ئیمۆ لە خدریشەوە وەرئەگرت، ئەوە بۆ تێستی نارەوەن بوو، چونکە گومانمان لە خۆبەخشییەکەی ئەکرد.. بەڵام دەرکەوت، هەم ڕاپۆرتەکانی بە دروستیی بۆ ئەگواستینەوەو هەم خۆیشی دڵسۆزانە کاری ئەکرد.

کۆژین: گەورەم تا ئێستاش وا دیارە، بەڵام بیرمان نەچێ مێردی لە سێدارە دراوە، مرۆڤ سایکۆلۆژیایەکی ئاڵۆزی هەیە.

سەرکۆ: خۆت سەربەستی چۆن بڕیاری لێ ئەدەیت، ئەو کەیسە خۆت لێی بەرپرسی، من گومانێکم لێی نییە وەک خۆم، بەڵام قسەکەت زۆر دروستە، ڕەنگە جیابوونەوەی بۆ وەرگرتنەوەی بڕێک پارە بووبێت لە پارە دەست بەسەراگیراوەکانی دارەوان.. بۆ نا؟ ڕەنگە بیر لە تۆڵەکردنەوەش بکاتەوە.. تا زۆرتریش وریابن باشترە. ــــــ Cut ــــــــ

دیمەنی – ٤٩٠ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و ئامۆو ئاواو تیرۆژو تریفەو هەڵشۆو خدرو ڕێژوان و هەندرێن و بروسک و چیمەن و سەلوا هەموو بێتاقەت دانیشتوون))

نارەوەن(( بۆ بێگانەکان)): ئەمڕۆش ئەرکتان زۆر کێشاو چاک ماندوو بوون، هەزارجار سوپاس ودەستتان خۆش بێ، یاخوا هەرگیز کۆستی گەورە نەبینن، چاکەی ئێوەم لەبەرچاوە.

(( هەموو: وەڵامدانەوە))

نارەوەن: دوو هاوڕێ و برای زۆر ئازیزی یەک هەبوون، ئێستا هیچیان لە ناومانا نەماون، بەهۆی بیرکردنەوەی خراپ و کاری خراپەوە.. کە ئەوانیش دارەوان زوبێر بوون.. ئەوە ئەنجامی سەرەڕۆیی و گوێ نەدانە بە یاسا.. یاسا بۆ ڕێکخستن و پاراستنی کۆمەڵگەیە کوڕینە کچینە، وا ئەکا هەمووان چوون یەک بن گەر جێبەجێ بکرێ.. ئەوی باکی یاساو ویژدانی نەبێ، وەک ئەو دووەی بەسەردێت.. لێتان ئەپاڕێمەوە، شوێنپێی ئەوان هەڵمەگرن.. چاوتان لەدوای کاری نابەجێ نەبێ.. چاوەڕوانی هیچ سوودێک مەکەن لە کاری سەرەڕۆیانە.. ئێوە کاری جوامێرانەو پاک هەڵبژێرن، بەوجۆرە باشترو خاوێنتر ئەژین.. دڵتان پاک بێ لە ئاستی یەک، سەرکەوتنی ئێوە لە ژیاندا بە خراپکردنی ژیانی ئەوانیتر بەدی نایەت، لەوانیتر گەڕێن هەرچی ئەکەن، ئەگەر باش بێ بۆ خۆیان سوودمەند ئەبن و ئەگەر خراپیش بێ ئاوایان بەسەردێت.

(( هەندێکیان ئیشەڵڵاو هەندێکیشیان بەسەرچاو ئەکەن))

نارەوەن: لە زانکۆ دکتۆرێکمان هەبوو، چەند وانەکەی بە باشیی ئەوتەوە، ئەوەندەش ئامۆژگاریی جوانی ئەکردین، کە چۆن ژیان بە دادپەروەریی ڕێک ئەخرێ، نەک بە توندوتیژیی و گەنکاریی. دوای ئەوەی زانکۆمان تەواوکرد، ئەوسا بیستمان کە باوکی بەهۆی کاری خراپەوە لە سێدارە درابوو، نەیئەویست کەسیتر ئەوەی بەسەربێت.. من ئەگەر بمزانیایە دارەوان خەریکی ئەو بەزمەیە، مەحاڵ بوو چاکی نەکەم، یان ئەم

هەموو مناڵە نەئەبوون و زۆر زوو جێم ئەهێشت.. بۆیە بەدڵ داواکاریی کاری باشەتان لێ ئەکەم.

خدر: بە ڕاستیی دیارە پارێزەرێکی باش دەرئەچووی ئەگەر ئەو کارەت بکردایە.

نارەوەن: چەند مانگێک کردم، پێش ئەوەی هاوسەرگیریی بکەم.. باوکم زۆری پێ ناخۆش بوو پارێزەر بووم، ئەیوت لە چیت کەمە تا ئیش بکەیت و لەناو خەڵکا دەرکەوی، ئیتر یادیان بەخێر، کاتێ ئەویش و برا بچووکەکەشم تیاچوون، من دنیام لێ تاریک بوو، وەزعی ماڵمان زۆر شێوا.. دارەوان هاتبووە پێشەوەو بە ناچاریی شووم پێکرد، لە ڕاستیدا وەک فریادڕەسیش دەرکەوت، کاتێ بە نەمانی باوکم و براکەم دووبارە هاتەوە پێشەوە.. ئیتر بە خاتری حورمەتی باوکم، بە یەکجاریی دەستم لە پارێزەرایەتی و ئیشکردن هەڵگرت و وەک وەسێتی باوکم تەماشام کرد، جگە لەوەش دارەوانیش وەزعی باش بوو.. ئیتر دڵم نەچووەوە سەر ئیش.. من چوزانم ئاوا پارەی پەیا ئەکرد.. هەرچییەکم داوائەکرد، نەء ی نەبوو.

(( هەندێک خواعافوویان کات و هەندێکیتر ڕوحیان شاد بێ))

بروسک: ڕەنگە حەزت بە ئیسراحەت بووبێ، ئەگینا کە باوکت پارێزەریتی پێ ناخۆش بوو و تۆش دەستت لێهەڵگرت، ئەی خۆ بۆ ڕەحمەتییش ناڕازیی بووە، بۆ شووت پێکرد؟

نارەوەن: ئێستا کاتی نییە، هەر ئەوەندە ئەڵێم ناچاریی بوو، ئەگینا ئەویش چیرۆکێکی درێژە. من تەممەڵ نەبووم کاکە بروسک، تەنها بەخاتری باوکم ئیشەکەم واز لێهێنا.. بەڵام دواتر کە خوا تریفەیدا، نازهەڵگرتنی ئەوم بە پێشتر زانی.

خدر: کاتێکیتر من ئەو چیرۆکەم ئەوێ.

نارەوەن: بەسەرچاو.. ئینجا کوڕینە، کچینە، هەزار ماڵتان لێ بکەوێتەوە ڕەببی.. لە سبەینێوە بۆ ئەو مەبەستە سەر مەدەن و ئەرک مەکێشن تکایە.. تەواو ئیتر بە خاتری هەموو لایەک و بۆ ڕەوینەوەی زامی منداڵەکانیش، پرسە هەڵئەگرین و کۆتایی پێدێنین.. ژیانیش بەردەوامەو گڵیش مەیلبڕە.

(( هەستانی میوانەکان و خواحافیزیی پرسە)) ________ Cut ________

دیمەنی – ٤٩١ – ش/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس و ئاکۆ))

گێلاس: نە نە نە، خۆ دزینەوەو دەرباز کردن نییە.. ئەو حسابەم بەمجۆرە بۆ بکە بەقوربان، ئەگەر ناشیزانی بمدەرێ خۆم ژمێریارییم تەواو کردووە.

ئاکۆ: دانیشە گێلاس گیان، من زۆر لەوە دڵنیام پارەکە ئەدەی بە عەرزاو هیچ ناهێڵێتەوە. بابە نیوەی پارەکە بەکاربێنە جارێ.

گێلاس: کەواتە ئەوەندەم لێ ڕائەبینی ئاکۆ؟

ئاکۆ: نەبابە حەز ئەکەی هەرچیم هەیەو نییە ئەیخەمە بەردەستت، بەڵام با جارێ دڵنیا بمەوە لەوەی سەرکەوتوو ئەبی یان نا؟

گێلاس: خەمی سەرکەوتنی منت نەبێ.. من بەزۆر خانووەکەم پێ گۆڕیتەوە لەگەڵ ڕێشارەکە، پارەیەکی زۆرمان دەستکەوت.. من ناردمیتە موزایەدەکەوەو خانووەکەمان وەرگرتەوە، تۆ ئەوەندە ئازا نەبووی لە خەویشا بیر لە کڕینەوەی بکەیتەوە.. ئینجا بەقوربان هەر خۆشم خانووەکەی ئەولام بەو نرخە بەرزە بۆ فرۆشتی بە ماڵی پورم.. کەواتە سێ دانە قازانجم ئەوێ و لە یەک دیناری خۆش نابم.. هەمووی بەهۆی منەوە دەسکەوتووە.. هاتوویتەوە خانووی خۆت و قاچت لێ ڕاکێشاوە.. قسەت ما؟

ئاکۆ: باشە، بەس هەرچی پێ ئەکەی، من ئاگادارکەرەوە.. خۆ ئەو باقیەکەی جاری پێشووشم داویتێ.

گێلاس: ئەوە ئیشی تۆ نییەو مەبە بە نارەوەن خۆت لە ئیشی خەڵکا هەڵمەقورتێنە.

ئاکۆ: ئاوا.. بووی بە خەڵکیش؟

گێلاس: بەڕاستی با پێت بڵێم، من سوورم لەسەر ئەوەی بۆت بسەلمێنم ژن و پیاو ئەتوانن وەکو یەک ئیش بکەن و سەرکەوتنیش لە ئیشا بە پیاوەتیی و ژنێتیی نییە.

ئاكۆ: تەواو تەواو من قەناعەتم كرد ژن و پیاو هیچ جیاوازییەكیان نییەو هەردووكیان وەک یەكن. تەواو؟

گێلاس: نا بەساقەوبم، من بە قسە نایسەلمێنم.. من ئەمەوێ بە كردارو بە چاوی خۆت ئەوە ببینی.

ئاكۆ: باشە دایەنگەیەک بكەرەوە.

گێلاس: ئەها پیاو! یان منالّ بەخێوكردن و دایكایەتیی، یان چێشتخانە بە ژن ڕەوا ئەبینێ.. ئەی بۆ یەكجاریی نالّێی چێشتخانەیەک دابنێم و خۆم چێشتەكەش لێ بنێم؟ دلّنیابە ئیشێک ئەكەم سەرت لێی بسوڕمێ.

ئاكۆ: بەخوا ئیتر وا جارێ دەرەقەتی دەمت نایەم و ئیتر دواییش نازانم.. باشە پرسیارێ.. ئەوە بۆ هیچ كەسێ جگە لە ئێمە هیچ نرخێكی نەدا لە موزایەدەكەیا؟ بڕی زۆر كەم نەبێ.

گێلاس: ئەو قسانە بۆ خۆت هەلّگرەوە، ئەگەر هەر ئەشترسیت، خۆت و كوڕەكە لە بیست و هەشتەمین ڕۆژەوە بچن بۆ سەفەرو هەفتەو دوویەک هەر مەیەنەوە، با هەر خۆم لەمالّ بم.. ئەوسا كێ خۆی بە پیاو ئەزانێ با من بكوژێ.. كورە فەقیر مەبە.. من لە قسەی ئەو شاموڕادەوە تێگەیشتم كە خۆی نامەكەی كردۆتە سەرمان، تا لە ترسا چۆلّیكەین، ئەگینا پیاوی دەست وەشاندن نییە.

ئاكۆ: دەی ئیشەلّلا لێمان هەلّئەكەوی گولّگێلاس!

گێلاس: بۆ؟ ئەوانەی هەلّكەوتوون چییان لە من زیاترە؟

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤٩٢ – ش/ د – سەرشەقامێک لە گەڕەکدا:

(( تایەرو هاوکارو شەماڵ و برزو و ئاکار، لەژێر ڕۆشنایی عمودێکا وەستاون))

برزو: ئینجا با پێتان بڵێم، کە چووینە سەر شامورادەکە، یەکسەر پێی ئەڵێین بمانبا بۆ لای پاشاکەی.. هەر ئەوەندە شوێنەکەیمان پێ نیشان بداو ئیتر خەمتان نەبێ، بەخوا سەری بە گوللە ئەبێژم ئەگەر ئەو دەرچێ.. بەڵام کاکە کێ ئەڵێ ئەو پاشایەش کوشتوویەتی، بۆ ئەوەی پۆلیسیش نەمانگرێ و هیچ شتێ نەزانێ.. بەڕای من ئەزانن ئەبێ چی بکەین؟

# (( ئەڵقەی بیست و چوار))

شەماڵ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئەرێ برزو هەست ناکەی زۆر ئەفەرموویت و قسەکانیشت زۆر بێ تامەو خۆشت لە خۆت تێناگەی؟.. دە مەجالی یەکێ بە شتێ بڵێ بەقوربان، خۆ فریای بەڵێیەکیش ناکەوین.

ئاکار: بەخوا ڕاست ئەکا زۆر ئەڵێی برزو گیان.. تۆ گوێ بگرەو ئەگەر ویستت شتێ بڵێی بە کورتی قسە بکە.

برزو: ئێ باشە.. ئەزانن چی بکەین باشە؟ (( یەک دووانێک سەر با ئەدەن)) بەڕای من هەر زۆر بە کورتی پێتان بڵێم باشتر وایە شاخە خۆی هەموو شتێکمان وەک هێلکە بۆ پاک بکات و ئینجا ئەگەر ئەو برادەرەشی بێتە پێشەوە..... (( شەماڵ توند دەمی ئەگرێ و برزوش دەستی لا ئەبا لەسەر دەمی)) ئەرێ ئەوە چییە شەماڵ؟ دە بهێڵە قسەیەک بکەم براکەم، خۆ من لە مەسڵەحەتی هەمووتانا قسە ئەکەم، نابێ ئاوا دەمم بگری.. ئەزانن ئەگەر دەمم بگیرێ..........

تایەر (( پەست)): ئەرێ کاکە دەبهێڵە شتێ تێبگەین.. کات درەنگە لە ئێوارەوە بە قسەی لابەلاو بێ مانا مێشکت بردوین.. ئەوە بۆ ناچیتە چایخانەکەی ئەوبەرەوە، ئەها قەرەباڵغیی لێیە، وابزانم یارییە، دوایی وەرەوەو قسە ئەکەینەوە.

برزو: دەباشە، کە هاتمەوە ڕاکەی خۆم ئەڵێم.

ئاكار: دەی باشە بەقوربان زوو بێیتەوە. (( برزو ڕائەكا بۆ چايخانەكە)) ئەڵێم با خێرا بچینە شوێنێک قسە بکەین تا نەهاتۆتەوە (( پێکەوە ئەچنە شوێنێکیترو لە میوتیدا نیشان ئەدرێن))

تابع ——— Cut

دیمەنی – ٤٩٣ – متبوع – ش/د – پارکێک لە گەڕەک:

(( ئاکارو تایەرو شەماڵ و هاوکار، ئەگەنە بەر ڕۆشنایی پارکەکە))

تایەر: ئیتر وا شاخە ئەیەوێ شوێنی ئەو پاشایە بدۆزێتەوە.

هاوکار: ئەی ئەگەر ئەو پاشایە ماتۆڕسوارەکەی نەناردبێ؟

شەماڵ: ئەی خۆ باوکیشم نەیناردووە؟ نە پۆلیس بێ و نە شاخە بێ و نەگەورەکەی بێ.. ئەی کێیە؟

ئاکار: بە ڕای من ئەو شامورادەکەی باسی ئەکا شتێ ئەزانێ.. چونکە نزیکە لە پاشاکەوە.

تایەر: ئەی چی بکەین؟ چۆن بتوانین قسەی لێ دەربێنین؟

ئاکار: وا باشترە ئەوەش بە شاخە بسپێرین.. ئەو شامورادە متمانەی بەو دووەی لای خۆی هەیە.

تایەر: وایە.

هاوکار: بەس ئەوەندە پێمان بڵێ، هەواڵی ئەوەی زانیوە کە پاشاکە ڕایسپاردووە یان نا؟

شەماڵ: ئەوە هەموو گرێیەک ئەکاتەوەو ئەشگەینە ماتۆڕسوارەکە.

تایەر: کەواتە شاخە بگرین و بەری نەدەین.

ئاکار: دەمخۆش!

هاوکار: بەڵام وا باشترە بەکۆمەڵ خۆتان نیشانی ئەو شامورادە نەدەن.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٤٩٤ – ش/ن – ماڵێ گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆ))

ئاکۆ: خۆ تۆ بە قسەی کەس ناکەی، من بە خۆڕایی دەمی خۆمت لەگەڵا ماندوو ئەکەم.

گێلاس(( پێکەنین)): کەواتە تۆ هەر بەدەم قسە ئەکەیت، قسەی دەمیش بە هەوادا ئەڕوا گیانم.

ئاکۆ: کچێ ئەوەندەم وتووە، پێویستی بە ماندوو کردنی مێشک هەر نەماوە، لەبەرم کردووە بەساقە، وەک قەوان لێی ئەدەمەوەو هیچیتر.

گێلاس: دە شتێک بڵێ بچێتە ئەقڵەوەو با بەقسەت بکەم.

ئاکۆ: واتە هەرچییەکم وتووە وەک خۆت ئەڵێی (( ڕوو ئەکاتە ئاسمان و فوو ئەکا )) بە هەوایا ڕۆشتووە.

گێلاس(( بزە )): ئەگەر عاجز نەبی، تا ئێستە بەڵێ. هههە.

ئاکۆ: دەی تەواو، تۆ بەڕێی خۆت و منیش بەڕێی خۆم، دڵنیابە یەک دۆلاریش چییە، لە پارەی من چاوت پێی ناکەوێ.. بچۆ پرس بە شۆڕشی برات بکە.. من ئیتر یەک وشەش لە دەمم نایەتە دەرەوە لە بارەی ئەم ئیشە جوانەی تۆوە.

گێلاس: بەدڵمە، بزانە خۆم چی ئەکەم.. سبەی دوو سبەی ئەچم بۆ هەڵگرتنی سیسەم و مێز توالێت و پێداویستی ژوورەکان.

Cut

دیمەنی – ٤٩٥ – ش/ د – ژووری پاشا:

(( پاشا بە بێ دەمک دانیشتووە، ڕوخساری دیار نییە، لە پشتەوە ئۆقەر وەرگیراوە.. خەلیل و ئاسۆی پاسەوانیش بە هەمان شێوە، بە پێوە وەستاون))

ئاسۆ: بەڵێ پاشا گیان، تەواو سۆراخمان کرد.. کەمێک ساختەچیی و تەڵەکبازە.

پاشا: ئەزانم تەماعی بخرێتەبەر، ئاسان دێت بە دەستەوە، حەددی ئەوەشی نییە کەڵەکچێتیی لەگەڵ منا بکا، وای ئەتەزێنم شەنیای کچی بیربچێتەوە.. هەندێ هەوڵی خۆمانەی لەگەڵا بدەن، ئیشم بە خۆی و بە شەنیاش هەیە.

خەلیل و ئاسۆ: بەسەرچاو فەرمانتە.

پاشا: لە ڕێگەی هەر کەسێکەوە بێ، چاودێرییەکی وردی پیاوەکانی شامورادیش بکەن، ئەوە فەرمانی میری گەورەیە، ئەبێ بە زوویی جێبەجێ بکرێ.

Cut

دیمەنی – ٤٩٦ – ش/ن – قاعەی بلیارد:

(( ئاواو ئامۆ لەسەر قەنەفەیەک دانیشتوون.. دووانیتر یاری ئەکەن))

ئامۆ: ئەمە بۆ ئێمە هیچ دەرناهێنێ.

ئاوا: ئەی بەو شەوگارە درێژە چی بکەم لە ماڵەوە؟

ئامۆ: ئەرێ وا شەوگار خەریکە هیچی وای لێ نەمێنێتەوە، فشە فشی چی ئەکەی، ئێستا ڕۆژ زۆر درێژە.. ئێرەش بە بەردەوامیی بۆ تۆ جوان نییە، پڕە لە هەرزەکارو شەڕانیی و دەنگە دەنگ دروست ئەبێت و هیچ پێی مورتاح نیم، بزانە یارییەک ئەکەم؟

ئاوا: وەڵڵا شازی شوێنە.. ئەی بچمە کوێ؟

ئامۆ: زۆر کەس کە وەزعیان وەک ئێمە وایە، بلیاردێک بۆ خۆیان ئەکڕن و شوێنێکی بۆ چاک ئەکەن و ئیتر لەناو خۆیانا یاری ئەکەن.

یەکێک لای یارییەکەوە: هەستە کاک ئاوا سەرەی تۆیە.

ئاوا: وا هاتم(( بۆ ئامۆ)): لێم تێکمەدە برا، ئێرە بۆ من زۆر باشە.

ئامۆ: دە من ئەچمەوە سەری دایکم و تیرۆژ ئەدەم، تەنیان.

ئاوا(( بەدەم چوونیەوە بۆ یارییەکە)): کورە ئەوان چەند بەچەند تەنیا بوون، دانیشە ڕاهاتوون.

(( ئاوا بۆ یارییەکەو ئامۆش ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٤٩٧ – ڕ- بەیانیی/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ بە جلی زانکۆوە..))

تیرۆژ: هەر نەهاتی؟

نارەوەن (( لە ژوورەوە دەنگی دێت)): وا هاتم کچم، پەلەی چیتە؟ خۆ ماویەتی.

تیرۆژ: سێ چوار دەقەی ماوە، پەلەت لێ نەکەم بە دە دەقەیتریش نایەیت.

نارەوەن: وا هاتم ئەها ئەهـ هەر یەک دەقە.

(( پاش کەمێک نارەوەن دێتە دەرەوە لە ژوورەکەو خۆی گۆڕیوە))

Cut

دیمەنی – ٤٩٨ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆو هەڵشۆ دانیشتوون، هاوڕێی چایچی دوو پیاڵەی بەتاڵ هەڵئەگرێت و ئەچێتە دەرەوە ))

هەڵشۆ: هیوادارم تۆش وەکو دایکت نەبی ئامۆ گیان!

ئامۆ: بۆ دایکم چییەتی؟

هەڵشۆ: نا حەددی ئەوەم نییە ڕەخنەی لێ بگرم.. بەڵام بە قسەی کەسی نەئەکرد، ئەم خدرە حەماڵەی کردبووە کەڵەگا بەسەر هەمووماندەوە، ئیتر وەکو کەس دڵسۆزی نەبێت لەو زیاتر.. بەخوا بەخوا دڵنیام ئەو خدرە تەماعی کردووەتە سامانەکەتان.

ئامۆ: هەڵشۆ هەرکەس بە کردەوەکانیا دیارە.. تا ئێستا کەس هەڵەیەکی بچووکیشی لە خدر نەبینیوە، جا لەوەتای باوکی ڕەحمەتیشم تیاچووە، ئەو کوڕە شەو و ڕۆژی خستۆتە سەر یەک و هەر ئیشی کردووەو لەخوا بەزیاد بێ داهاتێکی زۆر باشی کۆکردۆتەوە.. ئەوەش دڵسۆزیی ئەگەیەنێت.

هەڵشۆ: ئاخر دایکت هیچ دەرفەتێکی نەداینێ ئێمەش دڵسۆزیی خۆمانی بۆ دەربڕین، لەو باوەڕەدام بۆ نمونە من بمتوانیایە دوو ئەوەندەش بەدەست بێنم.

ئامۆ: هەڵشۆ گیان کە دڵسۆزێک هەبوو، پێویست بە کەسیتر ناکا سەری لێ تێک بدا.. سەیرکە.. باوکی ڕەحمەتیم قاوەخانەیەکی بۆ ئێوە کڕی و ژیانی بۆ دابین کردوون، بە چیا بزانین تۆ دڵسۆزتری لە خدر؟ کە هیچ کەسێک لەو قاوەخانەیە ناتبینێ و ئەگەر تریفەی داماو نەبووایە دەمێ بوو فرۆشتبووتان.

هەڵشۆ: ئەی ئەوە نییە منیش خەریکی سەیارە کڕین و فرۆشتنم؟ ئەی ئەڵێم تا گەنجین با خۆمان پێکەوە بنێین.. وەک تریفە هەیەو لەشی ساغ بێ قاوەخانەکە بەڕێوە ئەبا، ئەڵێم با منیش ئیشێکیتر بکەم، خۆ دنیا هەر ئەمڕۆ نییە.

ئامۆ: بەڵام ئیشی ئێرە وردەکاریی زۆرەو باوەڕ ناکەم تۆ لێی بزانی.

هەڵشۆ: خۆزگە لەوە تێبگەیشتمایە، بۆ هەموو دنیا متمانەم پێ ئەکا، ماڵی ئێوە نەبێ.. ئەشهەدوو باوکی ڕەحمەتیت باش بوو لەگەڵما.

ئامۆ: ئێستا هیچ پەکت کەوتووە هەڵشۆ؟ ئەگەر پێویستیتان بە هەر شتێک هەیە قسە بکە، ئێمە ئەگەر شیرمان پاک بێ برای یەکین کاکە.

هەڵشۆ: نەوەڵڵا لە خوا بەزیاد بێ وەزعمان هەر زۆر باشە.. بەڵام هەر خۆش بوو بانگتان بکردمایەو لەو هەموو سەروەت و سامان و کۆمپانیاو ئیشە، چمکێکتان پێ بسپاردمایە، نەک بێگانەکەتان بە دڵسۆزتر بزانیایە.

ئامۆ: قسەی سەیر ئەکەی هەڵشۆ.. یەعنی تۆ لەو بڕوایەدای من یان دایکم بزانین ئیشێک بە تۆ ئەکرێ و بیدەین بە خەڵکیتر؟

هەڵشۆ: بۆ تۆ باوەڕ ناکەم، بەڵام دایکت وا بیر ئەکاتەوەو ئەوەشی کرد.

ئامۆ: دایکم هیچی لەو بارەیەوە باس نەکردووە.. بەڵام هەڵبەت شتێک هەیە.

هەڵشۆ: جا ئەبێ چی هەبێ؟

ئامۆ: ئەتوانی ئەوە لە دایکم بپرسی.

(( یەک دوو دیالۆگی ترو هاتنە ژوورەوەی خدرو چوونە دەرەوەی هەڵشۆ، بێ سڵاو کردن لە خدر))

Cut

دیمەنی – ٤٩٩ – ڕ/ د – دوکانی لەنگە:

(( شاموراد ئەگەڕێتەوە بۆ دوکان و شاخەو ئدریس بە گەرمیی پێشوازیی ئەکەن.. شاموراد چاوی لەسەر تایەرو ئاکارو شەماڵە، کە لەوکاتەدا ئەوانیش بەوێدا ئەڕۆن))

شاموراد: ئەرێ ئەو گەنجانە ئەناسن؟

شاخە: نا.. خێرە؟ جەنابت ئەیانناسی؟

شاموراد: نایانناسم، بەڵام ماوەیەکە زۆر دەرئەکەون لەبەر دوکان، جاری وا هەیە لە پشتیانەوەم، کە ئەگەنە ئاستی دوکانەکە سەیری ناوەوە ئەکەن.

شاخە: خۆ گەنجی ئێستا هیچی پارەی پێ نییە، لەوانەیە حەزیان لە شتێک بێ و توانایان نەبێ بیکڕن.

ئدریس: نا نایانناسین گەورەم، لەوانەیەماڵیان لەم دەوروبەرە بێ.

شاموراد: کەواتە ئێوە گەمژەن.. ئەگەر یەکێک بۆ کوشتنیشتان بێت، هەر ئاوا ئەیناسنەوە.. بیللاهی وا بڕوا ئەم دوکانە ئەمین نییە بۆ دانیشتنی من.

شاخە: گەورەم چۆن ئەمین نییە؟ ئێمە بە ڕوحمان ئەتپارێزین.

شاموراد: کورە هەی بارگیر.. دوو سێ گەنج بەردەوام بە بەر دوکانەکەتا دێن و ئەچن، من کە جاروبار دێم بۆ ئێرە دەموچاویانم لەبەر کردبێ.. کەچی ئێوە ئەڵێن نایانناسین.. ئەی نابێ ئەو دەموچاوانە بناسنەوە کە زۆر دێن و ئەچن؟

ئدریس: گەورەم وەکو ئەوە، ئەرەوەڵا هەر زۆر باش ئەنناسینەوەو زۆر سەرنجیشیان ئەدەین بزانین چی ئەکەن و چی ناکەن.. بەڵام نازانین کێن، کارمان بەوە نییە.

شاموراد: بۆ هەموو کەسێک وریابن، ئێمە کاری گەنمان زۆرە، ناکرێ پاڵی لێ بدەینەوە.

(( لە میوتیدا بەدەم دایالۆگەوە ئەچنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٥٠٠ – ڕ/د – چایخانەکە:

(( هەندێ خەڵک دانیشتوون و هاوڕێ لەفەو چایان ئەداتێ و پاش کەمێک هەندرێنیش دێت و پاش بەخێرهاتن و وەڵام))

هەندرێن: هاوڕێ گیان لەفەیەکی شفتەم بدەرێ و چاکەش.

هاوڕێ: سەرچاو، هەروەک ڕۆژانیتر.

هەندرێن: ئا ئا.

هاوڕێ(( لەفەی بۆ ئەپێچێتەوەو چا تێ ئەکاو ئەیهێنێ)): فەرموو.. ئەرێ پرسیاری بکەم کاکە هەندرێن؟

هەندرێن: ئەی بۆ نایکەی؟!

هاوڕێ: ئەوە دە دوانزە ڕۆژە تەعزێ تەواو بووەو نارەوەن خان دەرناکەوێ.. ئیتر واز لە ئیش ئەهێنێ و ئەیداتە دەست کوڕەکانەوە.

هەندرێن: ڕاستیەکەی لەوە ئەچێ وابێ.. منیش هەروا تێئەگەم، ئامۆیان لێرەیەو ئاواش لە کۆمپانیاکەی ئەولا.. ئەی چییە؟ با بۆ خۆی ئیتر ئیسراحەتکا، ئیشی ئێرە زۆر گرانە، بەخوا کاک حەمەخدر نەبووایە دەرەقەتی نەئەهات.

هاوڕێ: وەڵا دەستی خۆش بێ، هەر ئەوەی باش کردووە.

(( لەفەو چا ئەخوات و هاوڕێ جێی ئەهێڵێ))

Cut

دیمەنی – ٥٠١ – ڕ/ د – بەر مۆبیلیاتێک:

(( گێلاس و دوو پیاو وەستاون))

گێلاس: بۆم بگەیەننە ئەو ناونیشانەی وەرتگرت.. پارەکەشت لەوێ ئەدەمێ.

پیاو: باشە بەسەرچاو، بە چەند کاروانێک ئەگات و بەیانیش وەستاکە دێت ئەیبەستێ

گێلاس: ١٤ ژووری تەواو، تەواوە؟

پیاو: بەڵێ، بەسەرچاو.

گێلاس: با دڵنیا بمەوە، وتم مۆرو سپییەکە.. بە دڵی خۆم نەبێ نامەوێ.

پیاو: تۆ ئەمرەکەی دادەگیان بێخەم بە.. هەرچییەکت بەدڵ نەبوو بیگێڕەوە.

گێلاس: دەی من ئەڕۆم.. سەعات چواری ڕێک لە ئوتێلەکە چاوەڕوانتانم.

(( خواحافیزیی و بەڕێکردن))

Cut

دیمەنی – ٥٠٢ – ڕ/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ لە زانکۆ دێتەوە، نارەوەن دانیشتووە کتێب ئەخوێنێتەوە ))

نارەوەن: ئەیرۆ ئەوە بۆ وا زوو هاتیەوە؟

تیرۆژ: موحازەرەمان نەمابوو، هەر سەیرێکی نمرەکانم کردو تەواو.

نارەوەن: باشن؟

تیرۆژ: خراپ نییە، ئەمساڵ ئەیبرم.

نارەوەن: دەی هەر ئەم ماوەیەیە کچم، تۆزێ ماندوو بوونەو ئیتر ڕزگارت ئەبێ.

تیرۆژ: خەمت نەبێ.

(( ئەچێتە ژووری خۆی بۆ خۆگۆڕین ))

———— تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٥٠٣ – متبوع – ڕ/ن - ژووری تیرۆژ:

(( تیرۆژ لیڤێکس و شتی فڕێ ئەداتە سەر سیسەمەکەو بە بێزاریی دائەنیشێت و دەست ئەگرێ بە ناوچەوانییەوەو قژی بۆ دواوە هەڵئەداتەوە))

<u>تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

هەر دیار بوو شوێنکەوتنەکەی ئەو خوێڕییە موراهیقانە بوو.. واااااى!!! وەڵا برام لە نزیکی ماڵی ئێوە کوژراوە، ئیتر چاوم بەرایی نادا تۆ ببینم.. ناپیاوە ناڵێ باوکم سترێسێکی زۆری دروست کردووەو ناهێڵی بتهێنم، پاساوی ناماقوڵ ئەهێنێتەوە.. دەبڕۆ ملت ئەشکاو هەردوو چاوت دەرئەهات، هەر ئەوەت قابیلە لە هەموو جێیەک بلۆکتکەم. تۆ نا سەدی وەک تۆ مەمنونە ئاوڕێکی لێ بدەمەوە... دەی یەکێکیتر لەو سەدە، کێ بێ؟ کێ بێ؟ هەی لەوە، خۆ کەس نییە وا هەیبێت.. ئای ی ی ! ئەوە چییە؟ نەوەڵا هەموو لات و پوتن.... دەی تیرۆژ ئادەی بگەڕێ بگەڕێ، ئای.. نەوەڵا نە تەلەبەو نە مامۆستاو نە هاوڕێ و نە فەیسبوک و ئەنستاگرام ئای ی... ئاخر هەموویانم دوور خستەوە، چاوەڕوانی ئەم سەگە بووم.....

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>:

(( بە هاتنی دایکی بەئاگا دێتەوە))

نارەوەن: ئەوە چییە خۆت نەگۆڕیوە سەعییەک بکەی؟

تیرۆژ: نا دایە گیان، هەر ئەم تاقیکردنەوانەیەو تەواو.. خۆم ئەزانم چی ئەکەم.

نارەوەن: دەی باشە کەیفی خۆت.

(( ئەچێتەوە دەرەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٥٠٤ – متبوع – ڕ/ن – هۆڵیماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن لە ژووری تیرۆژ دێتە دەرەوەو مۆبایل هەڵئەگرێت و تەلەفون بۆ چیمەن ئەکا ))

نارەوەن:هەلەو... چۆنی چیمەن گیان باشی گوڵەکەم؟

چیمەن (( دەنگ )): دەستت ماچ ئەکەم نارەوەن خان زۆر سوپاس، ئێوە چۆنن؟

نارەوەن: ئێمە باشین گوڵی گیان قوربانت.

چیمەن: یاخوا هەر باش بن نارەوەن خان گیان.

نارەوەن: چیمەن گیان ئەڵێم یەکەم مواجەی کە ئەچن بۆ لای باوکت، پێم بڵێ منیش دێم لەگەڵتان، حەز ئەکەم بیبینمەوە.

چیمەن: وەی بەسەرچاو نارەوەن خان بەسەرچاو.. وەڵا بە نیازین دوو سبەی بچین، هەر من و سەلوا ئەچین پیاوەکان ئەمجارە نایەن.

نارەوەن: دەی هەر زۆر باشە دڵەکەم، قوربانت.. هیچتان پێویست نییە بەساقە؟

چیمەن: نا قوربانت نارەوەن خان، زۆر سوپاس ئەرک ئەکێشن.. خوات لەگەڵ.

نارەوەن: خوات لەگەڵ.

(( نارەوەن مۆبایل هەڵئەگرێتەوەو ئەچێتە ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ٥٠٥ – ڕ/ ن – ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس و ئاکۆو دیار))

ئاکۆ: ئەی ڕاخەر؟

گێلاس: هەموو مۆکێتەکانیان هێناو وا کرێکار خەریکی ڕاخستن و سیکۆتین لێدانیەتی.

دیار: ئینجا بزانن چۆن بەڕێوەی ئەبەم؟ بەخوا ئەبێ ئوتێلێک بێ لەم ولاتەیا دەنگ بداتەوە، خەڵک لە شارەکانیترەوە بێن بۆ سەردانی.

ئاکۆ: بە تەنها پێت ئەکرێ؟

گێلاس: ئەی خۆ منیش دایم لە ئۆفیسەکەم ئەبم چاوم لێی ئەبێ.

ئاکۆ: ئای لە گێلاس!!! هههە بووی بە خاوەن ئۆفیسیش؟!

گێلاس: گاڵتەت پێی بێ، هەر ئاوا ساڵێک چاوەڕوان بەو بزانە چی ئەبینی؟!.. جا با پێت بڵێم، ئەمە یەک تۆز خەمی کرێکەیمە.. هەر لای عەرزەکەی خۆمانەوە یەک تۆزیتر ئاوەدان بێتەوە، بزانە چ تەلارێکی لێ هەڵئەچنم.. ئەوی ماوەتەوە بۆ ئەوەم داناوە.. سا گەر تۆزێ ئەمەش ڕوو لەخێر بێ، ئەوە ئیتر هەر مەپرسە چی ئەکەم.

ئاکۆ: بەخوا شەش تەلار بەری بە ئاسمانا، بەقەدەر تۆپێک قوماش دڵم پێی خۆش نییە کە کڕیار لە دەوری ئەئاڵێ.

دیار: ئەترسم باوکە ڕۆژێک بێت بڵێی دوکانەکە بە هەموو قوماشەکانەوە ئەفرۆشم و منیش ئوتێلێک ئەکەمەوە.! هههە

ئاکۆ: جا یاخوا وابێ.

گێلاس (( پشتی دەستی لەبەری دەستەکەی تری ئەدات وەک هێمای سەبر گرتن)): بوەستەو ببینە ژن چەند زیرەکن کاتێ دەرفەتیان بێتە دەست.. ئاکۆ یەک تۆز سەبرم لێ بگرە.. (( دەستی چەپی ئەخورێ)) خێر بێ یاخوا چەپم ئەخورێ.

ئاکۆ: ئەوە یەعنی هەرچی پارەت هەیە فت هههە ______ Cut _____

دیمەنی – ٥٠٦ – ڕ/ د – ناو سەیارەی تایەر:

(( تایەرو ئاکار))

ئاکار: بۆ تەلەفونێکی بۆ ناکەی؟

تایەر: ئەی ئەو کاتەی تەلەفونم کرد بۆ ژمارە تایبەتەکەی ئەو بوو.. داخرابوو.. دیارە کابرا لەوێیە.

ئاکار: مادام شامورادەکەش نازانێ پاشا لە کوێیەو بە چاوبەسراویی ئەیبەن بۆلای.. ئەبێ ڕێگەیەک بدۆزینەوە بیگەینێ.

تایەر: ئەگەر هەر شەوێک شامورادەکە دەرچوو بۆ لای و شاخە پێی وتین، دوای ئەکەوین.

ئاکار: برا ئەوان کە متمانەیان بە شامورادیش نەبێ و تا ئێستاکانێش پێی نەڵێن پاشا کێیە، چۆن حساب بۆ هەموو جوڵەیەکی دەوروبەریان ناکەن؟ دوور نییە دوایانکەوین و لە لایەکیترەوە دەسڕێژمان لێ نەکەن؟!

تایەر: دەی وەڵا نازانم، ئەی چۆن بیگەینێ، خۆ ناشکرێ شامورادیش بگرین و تێر شەقی بکەین تا دانی پیا ئەنێ.

ئاکار: ئەوە هەر ناکرێ، چونکە ئەویش شوێن و مەکانی نازانێ.. ئەبێ بیرێکی زۆر وردی لێ بکەینەوە.

تایەر(( زەنگی تەلەفونی دێت و هەڵیئەگرێ، سەرەتا بۆ ئاکار)): شاخەیە.. ئەلو.. بەڵێ........ ئێمە باشین.. دەنگ و باس؟ ......... ئادەی .................. چۆن؟؟؟؟؟ بە ڕاستتە؟.................. باشە باشە تۆ بوەستە.. ناکرێ شەو بێی بۆ دەوروبەری گەڕەکی خۆمان؟ ........ با لەماڵ ئەبم............ دەی باشە من و ئاکار لە ماڵ ئەبین ،،،،،،،،، باشە خوات لەگەڵ... (( تەلەفون تەواو))

ئاکار: چی بوو وا تێکچووی؟

تایەر: پاشاکە کاکەمی کوشتووە.

ئاکار: چۆۆۆۆۆن؟ بە ڕاستتە؟

تایەر: ئەڵێ شاموراد وتویەتی پاشا هەڕەشەی کردووە وتوویەتی کوڕەکانی لای تۆ هەر هەڵەیەک بکەن، یان نزیک بێ لەوەی پۆلیس دەسگیریان بکات، وەک ئەوی پێشوو خۆمان ئەیکوژین.

ئاکار: کەواتە ماتۆڕسوارەکە پاشا ناردویێتیی.. کە بریندار بووە، ترسی ئەوەیان هەبووە بگیرێن بۆیە وایان لێکردووە.

((تایەر هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە ئەگرێت و ئەداتە پڕمەی گریان))

Cut

دیمەنی – ٥٠٧ – ش/د / باخی حەوشەی ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو گێلاس و دیار، شۆڕش تەمەن ٤٥- ٥٠ ساڵ، لەبلەبان، چاکەت و پانتۆڵی لەبەرایە.. نینا زۆر جوان، تەمەن دەوروبەری ٢٥ ساڵ، تەنورەی سوورو بۆدیەکی پرتەقاڵی کاڵ یان زەردی کاڵی لەبەرە.. دانیشتوون.. دیار چاوی لەسەر نینایەو نینا ئیزعاج ئەبێت و خۆی بە مۆبایلەوە سەرقاڵ ئەکا))

شۆڕش: وایە، ئێستا ئوتێل زۆر باشە، من پشتگیری بیرکردنەوەکەی دادە گێلاس بووم.. بەڵام ئیتر ئیدارەدانەکەی کەمێک زەحمەتە.. کەسی تایبەتی ئەوێ ئاگای لە بازاڕو باجەکان و جۆری میوان و بەکارهێنانی ئاو و کارەباو کرێکارو سەرهەڵدانی کێشەو چارەسەر کردن و وەرگرتنی میوان و ئۆووو هەر زۆری تریش ئەبێ ئاگایلە هەموو ئەوانەو هەموو وردەکارییەکیتریش بێ.

ئاکۆ: ئاخر منیش خەمی ئەوەم بوو شۆڕش گیان، ڕاستە گێلاس دەرچووی ژمێریارییە، بەڵام ئاگای لە ئێستای بازاڕ نییە، هەر بە مەسەلە کۆنەکە، نازانێ چۆن ماسییە گەورەکان ماسییە بچووکەکان ئەخۆن؟

گێلاس (( دۆشداماو)): بەرە بەرە شارەزا ئەبم، بەشی ئەوانە ئەبێ وریا بم.

شۆڕش: جا تا تۆ وریا ئەبیتەوە، هیچت بەدەستەوە نامێنێ، هەرچییەکیشت هەیە ئەویش ئەخەیتە سەری و دایئەنێی.

گێلاس: ئەی بۆ لەسەرەتاوە ئەمانەت پێ نەوتم و پشتگیرییت کردم، شۆڕش گیان؟

شۆڕش: من ئەمزانی زۆر سووری لەسەر ئەوەی ئیشێک بکەیت و هیچ هێزێک نەیئەتوانی بتگێڕێتەوە.. کە ئەم بیرۆکەیەت باسکرد، هەستم کرد خەسارەتی لەوانیتر کەمترە.. تۆ ئەتوانی لەو بڕە پارەیە زیاتر خەرج نەکەیت و وەک ئەزمونێک تەماشایکەیت.

گێلاس: من پێویستیم بە تۆ ئەبێت.

شۆڕش: ئەوەی بە من بکرێت ڕەزیلیی تیا ناکەم.. تۆ ئەتوانی سوود لە نیناش وەرگری لەگەڵتابێ، ئەویش ژمێریاریی تەواو کردووە.

دیار: هەر زۆر باشە، ئەو کاتانەی منیش لەوێ نەبم، ئەتوانێ لەبری من لە ئیدارە دانیشێ.

نینا (( ڕەق)): من بۆ ئیدارە ناشێم، ئەگەر ڕێککەوت هەر لەگەڵ پورەگێلاسا ئەبم.

(( لە دەرگا ئەدرێت و دیار ئەچی بیکاتەوە))

گێلاس: هەر بە بست ناهێڵم لە خۆم دوورکەویتەوە نینا گوڵەکەی پورێ.

شۆڕش: ئەوە هەر کێشە نییە، دواتر لەسەر هەموو شتێک پێک دێین.

(( نارەوەن و ئامۆو ئاواو تیرۆژ دێنە ژوورەوە، پاش سڵاو و بەخێرهاتن و دانیشتن.. هەر لە دەرگاوە ئاوا چاوی ئەچێتە سەر نینا، لە بەخێرهاتنیشەوە نینا بزەیەکی بۆ ئەکات.. ئاوا بە جۆرێک چاوی لەسەری ئەبێت، باوکی نیناو دیارو گێلاس هەستی پێ ئەکەن، باوکی خۆی ئەبوێرێ))

نارەوەن: ئەوە چەند شەوێکە ئەمانەوێ بێین کاک ئاکۆ گێلاس خان، بەڵام بەخوا میوان ناهێڵێ، ئەمشەویش وتمان تا زووە بچین، ئێوە زۆر ماندوو بوون بە پرسەکەوە، بە ڕاستی سەلماندتان دراوسێی چاک چ مانایەکی هەیە.

ئاکۆ: جا کاک دارەوانی ڕەحمەتیی برای خۆمان بوو نارەوەن خان، ئەو قسانە چییە، بە پێچەوانەوە من بەهۆی ئەم وەزعەوە کە بەسەرم هات، هەر هیچم نەکردووەو کەموکورتییم هەبوو.

گێلاس: بەخوا بەقەد برایەکم لە دڵما شیرین بوو.. ئیتر دیارە خەڵکی خراپ ئەوەی پێ کردبوو، ئەگینا بەخوا کاک دارەوان هی ئەوە نەبوو.. خوا عافویکا، تازە هیچ ناوترێ و ناکرێ، ئێمەش هەر هیچمان نەکردووە خوشک گیان

ئاوا: دیارە ئەم پیاوە خزمتانە کاک ئاکۆ، لە تەعزێکەش بینیم هات.

ئاکۆ: ئۆو ببورن بە یەکترم نەناساندن (( بە یەکتریان ئەناسێنێ )).

ئاوا: جەنابت ئیشت چییە کاک شۆڕش؟

شۆڕش: ئۆو ئیشەکەی من کەمێک ناڕەحەتە، هەموو ڕۆژێک زللە وەشاندن و شەق وەشاندنە.

ئاوا (( پێکەنین )): بۆ ئیشی ئاواش هەیە لەم وڵاتەدا؟

شۆڕش: ئەی چۆن؟ من پۆلیسی ئادابم، بەیانی تا ئێوارە بەو بازاڕانەیا ئەخولێینەوە، هەر کوڕێک چاو ببڕێتە کچێک و وەڕسی بکا، ئێمە تێی هەڵئەدەین.

(( گێلاس و دیارو نینا دەست ئەگرن بەدەمیانەوەو پێ ئەکەنن.. ئاکۆ زۆری بەلاوە سەیر ئەبێ و دیقەتی شۆڕش ئەدا وەک ئەوەی بڵێ بۆ ئەوەت وت ))

شۆڕش: ئەی جەنابت ئیشت چییە کاکە ئاوا؟

ئاوا: ئیشەکانمان لە یەکەوە نزیکە. (( هەموو دیقەتی ئاوا ئەدەن ))

شۆڕش: چۆن؟ ناشێ تۆش پۆلیسی ئاداب بیت؟

ئاوا: نا قوربان من ئەفسەرم لە پۆلیسی ئاداب، بەڵام بەداخەوە بە خزمەتی جەنابت نەگەیشتووم.

نارەوەن(( تێئەگا شتێک ڕوویداوە )): گێلاس گیان هەر بۆ سوپاسکردن و پیرۆزانیمان هاتبووین.. ئێستا ماڵی شەوکەتی پورزام دێن ببورن ئەبێ بڕۆین، ئێوە دانیشن بەخێر (( هەڵئەسێ و ئاواو ئامۆش بەدوایا ))

گێلاس: ئەوە توخوا پەلەت چی بوو نارەوەن خان، دانیشتیتایە، خۆ هەر چایەکیشم نەهێنا..

(( پۆزش و ماڵئاوایی و خواحافیزیی و لەناودەرگاش ئاوا ئاوڕێک ئەداتەوە بۆ نیناو نینا پێ ئەکەنێ ))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٥٠٨ – متبوع - ش/ د – بەردەرگای ماڵی گێلاس:

(( خواحافیزیی و بەڕێکردنی ماڵی نارەوەن، گەڕانەوەیان و چوونە ژوورەوەیان بۆ ماڵی خۆیان و چوونە ژوورەوەی گێلاس و ئاکۆ))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٥٠٩ – متبوع – ش/د - حەوشەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و ئامۆو ئاوا دێنە ژوورەوە، نارەوەن توڕەیە، دەرگای دەرەوە دائەخەنەوە))

نارەوەن (( بۆ ئاوا )): ئەرێ ئەوە تۆ عەیب ناکەی؟ داوەشێی یاخوا داڕزێی باش؟ ئەمە بە حساب هێشتا باوکی کفنەکەی زەرد نەکردووە.

ئاوا: چییە دیسان ڕوخای بەسەرما؟ چیمکردووە؟

نارەوەن: هێشتا هیچت نەکردووە؟ خۆ خەریک بوو بچیتە ناو چاوی ئەو کچەوە بەستەزمانەوە، بەس ئەشهەدوو باوکەکەی چاکی تەزانی و چاکی پێ وتی ئەک ئەو دەستەی خۆش بێ.

ئاوا: ئاخر منیش باشم تەزاند.. ئەها چۆن نقەیم بڕی.

نارەوەن: ئەگەر فریات نەئەکەوتم و زوو هەڵنەئەسام، ئێستا پیس قەومابوو.. هەر حەیات بردم لای ئەو ماڵە.

ئاوا: ئەرێ بۆ من حەیام بردی؟ خۆت حەزت کرد زوو هەستی، وەڵا من حەزم ئەکرد دوو سەعاتیتر دانیشتینایە.

نارەوەن (( بە گاڵتەپێکردنەوە)): ئای! ئەی بۆ حەزت نەکرد؟ وەڵا ئەزانم بە تۆ بووایە تا ئەوان ئەڕۆنەوە لەوێ بووینایە.

ئاوا: ئەی هاوار، بەخوا تۆ شەڕم پێ ئەفرۆشی، ئەرێ ئامۆ من هیچم کرد؟

ئامۆ: نەوەڵا دایکە لە چاو دەرەوەیا هەر هیچی نەکرد هههە

(( نارەوەن بە هەردوو دەستی ئەکێشێ بەسەری خۆیاو ئامۆو ئاواش لە پشتەوە بە بێ دەنگ پێئەکەنن))

Cut

دیمەنی – ٥١٠ –ش/ن – ماڵی تایەر/ژووری تایەر:

(( تایەرو ئاکارو شەماڵ و شاخە))

شاخە: بەڵێ هەر زۆر بە ئیسراحەت وتویەتی خۆمان کوشتوومانە. ماتۆڕسوارەکەش سەر بە خۆیان بووە.

ئاکار: بەڕای تۆ چۆن ئێمە ئەیگەینێ؟

شاخە: زۆر زەحمەتە، ئاوا بۆمان نادۆزرێتەوە.. بەڕاستی من زۆر ئەترسم، ژیانی منیش لە مەترسیدایە.. هەرکاتێ من شتێکی بچووکم بەسەر بێ، ئەو کابرایە لەبری ئەوەی ڕزگارمکا، منیش ئەکوژێ.

تایەر: هەر ئەبێ تۆ ڕێگەو شوێنی بدۆزیتەوە شاخە.

شاخە: نازانم چۆن؟

ئاکار: تۆ وا بکە منیش بێمە لاتان.

شاخە: شتی وا ناکەم ئاکار، من خواخوامە خۆم لەدەستیان ڕزگارم بێ، چۆن تۆ تووش ئەکەم.

تایەر: منیش ئەڵێم تۆ تێکەڵیان مەبە.. بەڵکو ڕێگەیەک بدۆزینەوە.

ئاکار: بێیتە ئەوێش هەر بەقەد منت پێ ئەکرێ، لەوە زیاتر هیچیترت پێ ناکرێ.

ئاکار: تۆ من ببە لای خۆتان و ئیتر حەقتان بەسەر هیچەوە نەبێ.. چۆن زایەرت هەڵکێشاوە لای شامورادد، من زیاتر هەڵکێشەو ئینجا بزانە من ئەگەمە پاشا یان نا؟

تایەر: زۆر مەترسیدارە ئاکار.

ئاکار: ناشکرێ هەر ئاوا چوارمشقی دانیشین، برای تۆیە، ئامۆزای منیشە تایەر.

تایەر: دە منیش دێم.

ئاکار: بۆ تۆ هەر زۆر خراپە.

تایەر: بۆ بۆ تۆ باشەو بۆ من خراپ؟

ئاکار: تۆ کەمێک هەڵەشەیت و برینەکەت تازەیە، تۆ برای بوویت و زوو هەڵئەچی، تۆ بچیت، زۆر خراپ تێئەکەوی.. لارییان نییە تۆش بخەنە لای زایەری ڕەحمەتیی.

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥١١ – ڕ/ د – بەردەم ماڵی کۆژین:

(( سەیارەی ئاسایش هاتووە بە شوێن کۆژیندا.. ماڵەکە ڕووی لە دەشتاییەکە.. بێستان بە جلی ماڵەوە، هاتۆتە دەرەوە بۆ بەڕێکردنی))

کۆژین(( پێش ئەوەی بچێتە سەیارەکەوە)): ئەوە پێموتی بیرت نەچێ، سەردانی دکتۆر بکەی.

بێستان: باشە دڵنیابە ئەچم،

کۆژین: ئاخر ئەوە پێموتی، کەمتەرخەمیی نەکەی.. ئاگاداری لێخوڕینیشت بە، خۆت لە تاسەو شت نەدەی، هێمن بڕۆی باشە.

بێستان: بەسەرچاو، کەمێکیتر ئەچم، بێخەمبە.

(( ڕۆشتنی کۆژین و بێستان ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٥١٢ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و شۆڕش و نیناو دیار دانیشتوون))

شۆڕش: ئیتر نینا خۆی ئەزانێ ڕیکلامی ئەم جۆرە ئیشانە چی پێویستەو ئەزمونی زۆرە.. ئێستاش بۆ چەند کۆمپانیایەک ئیش ئەکا.. با ئەوەی تۆ بکا بە ناودارترین ئوتێل، بۆ پوری خۆی ئەکا بە زایە ناچێ.

گێلاس: بە قوربانی نینا گیان بم، ئەک پوری لەدەوریگەڕێ.

نینا: خوانەکا پورێ گیان.

دیار: منیش شارەزاییم هەیە، هاوکاریی ئەکەم.

نینا(( پەست)): بە یارمەتیت من هاوکاریی کەسم ناوێ و ئەبێ تەنیا بم، ئەگینا ئیشم بۆ ناکرێ.

شۆڕش: ڕاست ئەکا، هەر بە تەنیا ئیشی کردووە دیار گیان.

دیار(( پەست)): ئێ دەباشە من هەر هیچ هاوکارییەکی ناکەم (( ئەچێتە دەرەوە))

شۆڕش: ئەوە تووڕە بوو.

نینا: ئینجا با تووڕە بێ.

گێلاس: نا نا تووڕەی چی، دیاری من زۆر فەقیرە، تووڕەبوونی هەر نییە.. ئەوە چووەوە سەرەوە.

شۆڕش: دەی ئیتر من جێتان ئەهێڵم، با ئیشی خۆتان بکەن.

(( شۆڕش ئەڕوات و نینا ئەچێتە سەر مێزەکەو لاپتۆپ ئەکاتەوەو گێلاسیش لەسەر قەنەفەیەک دائەنیشێ))

Cut

دیمەنی – ٥١٣ – ڕ/ د – بەردەمی چاخانەکە:

(( ئەردەڵان بارێک لەسەر عەرەبانەکەیەتی و هاوڕێ لە لایەوە دانیشتووە ))

هاوڕێ: دەبڕۆ بارەکە بەرە ڕۆڵە، ئاخر دووابیش ئەڵێی ئیش بە من ناکەن.

ئەردەڵان: نا.. حسابی خۆم کردووە، تا چارەکێکیتریش نەیگەیەنمە ژوورەوە، کەس ناڵێ کوا.

هاوڕێ: دەی با زووتر بیبەیت و دەستخۆشیت لێ بکەن، ئەوە باشتر نییە؟

ئەردەڵان: کورە لەماڵەوە ئەوەنەم دەستخۆشیی هەڵڕشتووە لە ژوورەکەیا، ڕێ بەر ڕێدار ناکەوێ.. دەستخۆشیم بۆچییە گەوجە؟ ئەم بارە کرێکەکەی کەمە کرێکەی!

هاوڕێ: هههە هەتیو تۆش بۆ حاڵی خۆت چەند زۆرزانی.

(( خدر دێت و ئەیانبینێ و پاش سڵاو و وەڵام ))

خدر (( بۆ ئەردەڵان )): ها نەگریس، ئەوە چییە بەدەم باری خەڵکەوە چا ئەخۆیتەوە؟

ئەردەڵان: خۆ بارەکە کلۆشەکر نییە چای پێ بخۆمەوە کاک حەمەخدر؟.. ئەمە باری خەسرەو جامخانەیە.. خۆت ئەزانی چەند ڕەزیلەو هیچی وای لێ هەڵناوەرێ.

خدر: داخی خەسرەوجامخانە لە دڵی منایە ئەردەڵان، تا بارێکم بۆ ئەبرد، خۆم لە دەی ئەدزییەوەو ئەموت ئەوە ئەردەڵانە.. بێ ئیشە هههە

ئەرەڵان: ئەوەشت لەگەڵ کردووم؟

خدر(( بۆ هاوڕێ )): کورە جارێکیان ئەم خەسرەو جامخانەیەو فەریقی لامل سوتاو هەردووکیان باریان هەبوو.. من و ئەردەڵانیش سەرەمان دانابوو.. یەکەمجار سەرەی من بوو، ئیتر وا ڕێککەوت خەسرەو لە پێشا بانگی کردین، ئەبووایە من بچم.. ئاگاشم لێیە وا فەریق باری بۆ دێت، هەر خەریک بوو شەق ببەم.. بەس خواوڕاستان بیرم کەوتەوە خەسرەو بە چی توورە ئەبێ.. هەر لێی نزیک کەوتمەوەو وتم مام خەسرەو جامخانەکەت بۆ نەشۆم؟ پیس نییە (( پێکەنینی بە کوڵ )) کاکە کابرا لێم بەلەسە بوو

هەزارو یەک جنێوی پێدام، منیش بۆ زۆڵێتیی هەر زوو زوو ئەموت عەفومکە غەڵەت بووم.. کاکە هیچ دادی نەبوو، وتی ڕووی بابی ئەوە ڕەش بێ تا ماوە بار بە تۆ بار بکا.. ئا وەرە ئەردەڵان.. وەڵا ئەردەڵانی بانگکردو ئەردەڵانیش ئیمانی لەسەرا نەمابوو لە ژێرەوە مۆڕەی لێئەکردم.. وتم من بڵێم چی ڕاستە سەرەی منە، بەس ئەوەتا کابرا تۆی خۆش ئەوێ؟.. جا هەر بڵێی یەک و دوو فەریق بانگی کردم و باری چاکیشی هەبوو.

ئەردەڵان: بیرمە، وەڵا وەک ئێستا لە بیرمە.. ئای خەفەتم خوارد خوای گەورە.. دەی منیش ئێستا ئەچم و پێی ئەڵێم ئەوە بارەکەت خەسرەو جامخانە پیس.

خدر: هەر شێت ئەبێ وا بڵێی. بە یەکجاریی ڕزگارت ئەبێ.

هاوڕێ: کورە کاک حەمە خدر، ئەم هەتیوە وەک تەممەڵە، هەر بە فریای خۆشیەوە ناچێ.. زۆر گەمژەیە.. هەر هیچ نازانێ.

ئەردەڵان: دەی ئێستا ئەمبینن (( هەڵئەسێ و بە گورجی عەرەبانەکە پێش ئەدات و بۆ ناو بازاڕەکە))

خدر(( هەڵئەسێ)): هاوڕێ گیان چاکەی خۆمم بۆ بێنە بۆ ئۆفیسەکە.

هاوڕێ: بەسەرچاو.

(( خدر ئەچێ بۆ ئۆفیسەکە، هاوڕێش بۆ چا تێکردن))

Cut

دیمەنی – ٥١٤ – ڕ/ د – ساحەی زیندان:

(( زوبێرو نارەوەن و چیمەن و سەلوا ))

زوبێر: بەهۆی لێخۆشبوونەکەی تۆوە، سوپاس.. کەمێک حوکمەکەم سووک کراوە.. بەڵام جارێ هەیهوو لە کوێیەتی؟ مەگەر ئەو دەنگۆیەی کە هەیە بەڕاست بگەڕێ.

نارەوەن: خوا کەریمە، نائومێد مەبە کاک زوبێر.. دەنگۆی چی هەیە؟

زوبێر: وەڵا ئیتر ڕاست یا درۆ، لێرە دەنگۆی ئەوە هەیە کە لێبوردنی گشتیی دەرئەچێ.

نارەوەن: ئەی یاخوا ڕاست بێ و وەک دارەوان چوو، خوا تۆمان بۆ بهێڵێ.

چیمەن: توخوا بەڕاستتە باوکە؟ ئەی لەخوا بەزیادبێ، چەند خۆشە ئەگەڕێیتەوە ماڵەوە (( لە خۆشیا ئەگری ))

سەلوا: دەی مامە گیان ئیشەڵڵا ئەگەڕێیتەوە، خەم مەخۆ.. بەخوا خەوێکی زۆر خۆشم پێوە بینیت، زۆر دڵنیابە ڕاست ئەبێت و ئیشەڵڵا بەم نزیکانە لە ماڵەوە پێکەوە کۆ ئەبینەوە.

چیمەن (( دەست بەرەو ئاسمان )): خوای گەورە دڵمان خۆشکەی.

نارەوەن: تۆ بگەڕێوە ناومان، ناشوکری نەبێ نە باوک و نە برا، سەرگەورەیەکمان نەماوە.. خۆت باوک و برای هەمووان بە کاکە زوبێر گیان.

زوبێر: بەو هیوایە.. ئێمەش ئەوەندەمان بەبەرەوە نەماوە نارەوەن، ئەو کەمەی لە ژیانا ماومانە، وا بکەین منداڵ دابین بکەین و پاشەڕۆژیان مسۆگەر بێ، ئیتر چیترمان ئەوێ؟

چیمەن: قەت وا مەڵێ باوە گیان، ئیشەڵڵا زۆر تەمەن درێژ ئەبن.

سەلوا: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ من وا ئەگەڕێم ژنت بۆ بدۆزمەوە، تۆ باسی چی ئەکەی؟

(( پێکەنینی هەمووان و دیالۆگ لە میوتیدا )) ______ Cut ______

دیمەنی – ٥١٥ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی کۆژین:

(( بێستان سکی کەمێک بەرزە، جلی حامیلەی دەرەوەی لەبەردایە.. بە سەیارەکەیەوە لە گەراجی ماڵەوە دێتە دەرەوە.. ماڵەکەیان لە نزیکی چۆڵەوانیدایە.. دائەبەزێت و گەراجەکە دائەخاتەوەو ئەیەوێ بچێتەوە سەیارەکەی.. لە کاتی سەرکەوتندا کە نیوەی گیانی لە دەرەوەیە.. ماتۆڕسوارێک دێت و تەقەی لێ ئەکا..

# (( ئەڵقەی بیست و پێنج))

چەند ژن و پیاوێک لە بێستان کۆئەبنەوەو یەکێکیان داوای ئەوە ئەکا تەلەفون بۆ پۆلیس و بۆ اسعاف بکرێ.. دووکەس تەلەفون ئەکەن))

Cut

| | |
|---|---|
| دیمەنی – ٥١٦ – ڕ/ د – شەقامی نزیکی هەر چاخانەیەک:<br>(( تایەر لەسەر شەقامەکە نزیکی سەیارەکەی وەستاوەو تێل ئەکا، باگراوند چاخانەیەک بێت))<br>تایەر: ١- پێت نەوتووە تائێستا؟ .......... ٢- بۆ باش بووە؟ خۆ نەیئەخواردی؟ ......... ٣- ئا ئەی خۆ زۆر دەمێک نییە!.............. ٤- دەی بە ملی شکاوت، ئەی بۆ ئەو کاتە قسەت نەکرد؟ ........... ٥- دەی ملت شکێ بۆ خاتری فەخری عالەم، ئەی ئێستا چی بکەین؟ ............ ٦- جا لە ئدریس دڵنیای؟ توشت ناکا؟............ ٧- دەی دەبزانە ئەویش ئەڵێ چی و شەوێ دەرکەوە با قسەی لێ بکەینەوە ......... ٨- دەی باشە.. خواحافیز.<br>(( مۆبایلەکەی دائەخاتەوەو ئەچێتەوە چاخانەکە برزوی لێیە، لایەوە دائەنیشێ))<br>__________ Cut __________ | دیمەنی – ٥١٧ – ڕ/ د – بەردوکانی لەنگەکە:<br>(( شاخە وەستاوە تەلەفون ئەکا))<br>شاخە: ١- نەوەڵا باش بوو پێش ئەوەی پێی بڵێم، ئدریس فریام کەوت وتی نەکەی پێی بڵێی............. ٢- نا برا نەیئەخواردم، بیرت دێت کە پێموتی مەیەن بەوناوەیە سەرنجی زۆر لەسەر ئێوەیە؟.............. ٣- ئەو کابرایە هەر ئاکار ببینێ یەکسەر ئەزانێ ئەمە دەسکیسەیە.. چۆن من ئەوسا وتم نایناسم و ئێستاش بە شان و باڵیا هەڵبڵێم.. ئەو یەکسەر گومان دروست ئەکا .................. ٤- خۆ بە ئێوەشم وتبوو، ئێوەش بیرتان لەوە نەکردەوە، وەڵا ئەمە ئدریس نەبووایە تیاچووبووین، هەموو شتێ ئاشکرا ئەبوو ............ ٥- ئدریس ئاقڵە، با بزانین ئەو ڕێگەیەکمان بۆدانێ............ ٦- کورە ئەوە ئەڵێی چی؟ ئدریس لە من تۆقیوترە، خوا خوایەتی ڕزگارمان بێ لەدەست ئەم پیاوکوژانە .......... ٧- باشە بەسەرچاو، من ئەتوانم تا سەعات ١١ لای ئێوەبم، چونکە دیسان ئەمری کردۆتەوەو ماڵبڕینمان هەیە ............ ٨- خواحافیز<br>(( مۆبایل هەڵئەگرێتەوەو ئەچێتەوە ناو دوکان))<br>__________ Cut __________ |

دیمەنی – ٥١٨ – ڕ/د – بەردەمی چایخانەکە:

(( گێلاس و نینا لە بەردەمی چایخانەکە سەیارە ڕائەگرن و بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەچن.. هاوڕێ و ئەردەڵان دانیشتوون.. دوای تێپەڕینیان ئەردەڵان بە خۆیا ئەکێشێ و ورگ و گیانی ئەلەرێتەوە))

هاوڕێ: ئەوە بۆ وا کەوتیە سەر هەززە؟

ئەردەڵان: کورە بینیت؟ ئەو پەرییەت بینی ئەو کچی عاسمانە؟

هاوڕێ: ڕۆڵە بە گیرفانی پڕەوە ئەتوانی سەیری ئەوانە بکەی.. بە من چی؟ وەڵا هەر بایەخیشم پێ نەدا.

ئەردەڵان: یەعنی بۆ فەقیرو فوقەرا سەیر کردنیش قەدەغەیە؟

هاوڕێ: ئەی چۆن ڕۆڵە؟ فەقیری داماو هەناسەش لە زیادە وەرئەگرێ، بۆ چی باشە؟

ئەردەڵان: کورە بەخوا زۆر عەجیب بوو هاوڕێ، نازانم ئەم دەوڵەمەندانە بە چی وا جوان ئەبن؟ ئەوە پارەکە قەینا ئەگەر بە ڕەنجی شان بێ، یان بە ئەقڵ، کورە بابە ئەگەر بە دزییش پەیای کردبێ عافێتی بێ، بەس جوانییەکە بە چی؟

هاوڕێ: زۆر لەسەری مەڕۆ (( ئامازەی ئۆفیسەکە)) خوا خۆی ئەزانێ ئەیدا بە کێ و (( ئامازەی خۆی و ئەردەڵان)) نایدا بەکێ.. ئەوە لە دەسەڵاتی من و تۆیا نییە، ورگە گیان.

Cut

دیمەنی – ٥١٩ – ڕ/ د – بەردوکانی لەنگە:

(( شاموراد لە دەرەوە تێل ئەکا، چاو ئەگێڕێ و کە کەسێک دەربکەوێ بە دەنگی نزم قسە ئەکا ))

شاموراد: بەسەرچاو پاشا گیان.. بەڵێ شوێنەکەم زانی.. لە خزمەتدام، یەک زەڕڕە خەمت نەبێ وابزانە جێبەجێ کراوە.......... بەڵام پاشا گیان دڵنیان پارەو ئاڵتونەکە هەیە؟ با جێی نەهێڵن تا ئەیهێنن........... دەی زۆر باشە تەواو، لە ژێر عەرزیشا شاررابێتەوە ئەیهێننە دەرەوە... (( تێل تەواو)) ئەوە خۆ کوڕی سەگە بەسەرما دایخستەوە دیسان.. قەینا شایانی لەوەش زیاتری شاموراد. (( بەرەو دوکان دێت))

شاخە: دیسان کەتنە؟

شاموراد: ئا، ماڵێکی زۆر گەورەیەو جێ و ڕێی چوونە ژوورەوەشی پێوتم.. بەڵام کوڕینە بە قسەی من ئەکەن، چەک بەرن لەگەڵ خۆتانا، گەر خوانەخواست بریندارییەک یان شتێ بوو، نەک ماتۆڕسوارەکە بگاتە سەرتان، ئێوە دەست پێشخەن.

ئدریس: بە قەبری باوکی بۆ سەد پاشای ئاقڵی ئەکەم، من زایەری داماو نییم تازە بوو هیچی نەئەزانی.

شاخە: من شتێکیتر ئەکەم.

شامورا د: ئادەی؟

شاخە: هەر هیچ نەبێ خۆمان لەو ماتۆڕ سوارە ئەپارێزین.

ئدریس: چۆن؟ بە براکەی زایەر ئەڵێی ئەویش دێت؟

شاخە: ڕێک ئەوە ئەکەم.. دڵنیام دێن، ئەوسا یان ئەیگرن و ئەیدەنە پۆلیس و ئەبێ بە کۆسەڵەو نە پاشا ئەمێنێ و نە کەس، یان هەر لەوێیا ئەیکوژن و ئەو مەترسییە نامێنێ.

ئدریس: تەلەفونیای بۆ بکە، باش نییە گەورەم؟

شاموراد: خراپ نییە، بەڵام با لە ئیوە نزیک نەکەونەوە.

شاخە: دە شوێنەکەم پێ بڵێ و کاتەکەشی با ئاگاداریان بکەمەوە.

((لە میوتیدا پێیان ئەڵێ))

Cut

دیمەنی – ٥٢٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر/ژووری زوبێر:

(( ئاوا دانیشتووە لە جێیەکەی زوبێرو دواتر ئامۆ، مۆبایلی بەدەستەوەیە، پێکەنین و دایالۆگ لە میوتیدا.. ئامۆ دێتە ژوورەوە بۆلای ))

ئاوا: باشە گیان دوایی تێلت بۆ ئەکەمەوە (( مۆبایل دائەنێت کەمێک لەبەر ئامۆ وەک لەبەر هەستان قنگ ئەجوڵێنێ )) بەخێر بێی!

ئامۆ(( ڕووخۆش )): جا لە خێر زیاتر چی لە من ئەوەشێتەوە؟!

ئاوا: تۆ جارێ پێم بڵێ ئەو ڕووخۆشیی و دڵخۆشییەت بۆ منە، یان خۆت کەوتووی بەسەر نازو نیعمەتا؟

ئامۆ: کەی منت بینیوە بە نازو نیعمەت دڵخۆش بم؟.. هەواڵێکم پێیە بۆ تۆ، بەڵام بەخوا هەرزانفرۆشی ناکەم، نەبەخوا.

ئاوا: نازو نیعمەتە بۆ من؟ (( ئامۆ سەرئەلەقێنێ، بە بەڵێ )) دەی کەواتە دەعوەتێکی گەورە.

ئامۆ: خۆت کەر مەکە.

ئاوا: دەعوەت و قاتێکی مارکەو سەراپا.

ئامۆ: هەر کەمە.

ئاوا: تۆ جارێ پێم بڵێ، ئەگەر هێنای بەڵێن بێ بە دڵی خۆت داوا بکە.

ئامۆ: کچی کابرای پۆلیسی ئادابەکە هات بۆلام، وتم ئای ئاوا لە کوێت بێنم؟

ئاوا(( بەپەلە هەڵئەسێ و ئەچێتە لایەوە )): بۆچی هاتبوو؟ ئەی بۆ تێلێکت بۆ نەکردم؟

ئامۆ: خۆی دێتە بەردەستت خەمی ئەوەت نەبێ، ئەمڕۆ نا سبەی.. بەڵام پێم بڵێ ئەهێنێ؟

ئاوا: کورە بە دڵی خۆت داوای هەرچی ئەکەی بیکە، ئەرەوەڵا هەر زۆریش ئەهێنێ.

ئامۆ: یەکەم ئەم کچە برازای گێلاس خانەو مەجالی ئەمسەرەو سەری تیا نییە وەک ئەوانیتر.. دووەم هەر زۆر جوانە بە حەق.. سێیەمیش زۆر ڕەوشت بەرز دیارەو کراوەیە.

ئاوا (( لالوتی سوعبەت )): ئێ، تۆ جارێ داواکەی خۆتم پێ بڵێ.

ئامۆ: داواکەم ئەوەیە کە ئەزانم کەس دژی زمانە لوسەکەت ناوەستێتەوەو ئەم کچەش ڕازیی ئەکەی.. بەڵام داواکەم ئەوەیە بیهێنی و ئیتر بگەڕێیتەوە.. (( سەرزەنشتی سوعبەت )) بەسە برا، گەورە بووی هەهە.

ئاوا: بە ڕاستی لەو شەوەوە بیری لێ ئەکەمەوە، هەر خۆشم بڕیاری ئەوەمدا ئەگەر ئەم کچە بدۆزمەوە، بەڵێن بێ دوا کچ بێ بیناسم.

ئامۆ: گەورەترین خەڵاتت کردم، ئەمە بەڵێنە؟

ئاوا: بە قەبری باوکم بەڵێن بێ.

ئامۆ: کەواتە تەواو.. لەگەڵ گێلاس خان هاتنە دوکان، گێلاس خان پێشتر بە تەلەفون پێی وتم من و ژمێریارەکەم بۆ ئیشێک دێینە لات و ئیتر ئەوە بوو کە هاتن ئەو دەرچوو.

ئاوا: بۆ گێلاس خانیش کۆمپانیای داناوە تا ژمێریاری هەبێ؟ ئەک پێ نەگەی گێلاس خان!! هەهە.

ئامۆ: نا کورە کۆمپانیای چی؟ ئوتێلێکی چوار ئەستێرەی کردۆتەوە.

ئاوا: ئێ ئێ!!!

ئامۆ: داوای دابینکردنی ئازووقەیان کرد بە بەردەوامیی بۆ چێشتخانەی ئوتێلەکەیان و ئێمە بینێرین و هەموو کرێیەکیش لەسەر خۆیان.

ئاوا: ئای کە باشە.

ئامۆ: گۆشت و مریشک و ئیتر هەرچی هەیە لەسەر ئێمە دابینی بکەین و مانگانەش حساب ئەکەین.

ئاوا: کورە من مانگانەکەیان ئەدەم ئەگەر پێیان نەدرا.

ئامۆ: کچەکە ناوی نینایەو ئیتر ڕۆژانە ئاگادارمان ئەکاتەوە چی بنێرین.. منیش بە کاک حەمە خدرم وت، ئەوە بە ئێمە ناکرێ با یەکێک ڕاسپێرین ئەو سەرپەرشتی ناردنەکە بکا.. (( پێکەنین)) کەچی خۆی وتی برا چاوبزەکەت نەبێ، باوکم پۆلیسی ئادابە ئەیکوتێ هههههە.

ئاوا: بەڕاست خۆی وای وت؟

ئامۆ: بەسەری تۆ.

ئاوا: بەسەری هەردووکمان هەر ئەو شەوە بۆم دەرکەوت مەیلێکی بۆم هەبوو.. ئێ دواتر چی؟

ئامۆ: گێلاس خان وتی نا نا ئاوا سوعبەت چییە، ئێمە چەند بەچەند کچمان هەبووەو بەرامبەری یەک بووین، خوانەخواست هیچ شتێکمان لێی نەبینیوە.

______ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut ____________

دیمەنی – ٥٢١ – ڕ/ د – نەخۆشخانە:

(( کۆژین و سەرکۆو ڕاهۆزو تریفەو چەند کەسێکیتر لە ژن و پیاو لەبەر هۆڵی نەشتەرگەریی وەستاون، پاش کەمێک پزیشکێک دێتە دەرەوە، کۆژین بە خێرایی بەرەو پیری ئەچێ، ڕاهۆزیش لەو کاتەدا دێت))

کۆژین: توخوا خێر بڵێ دکتۆر گیان.

دکتۆر: شوکور خۆی سەلامەتەو مەترسیی لەسەر نەماوە.. بەداخەوە فیشەکەکە بەر ڕەحمی کەوتووە، منداڵەکەی لەدەستدا.

کۆژین(( گریان و پێکەنین)): زۆر سوپاس زۆر سوپاس، گرنگ خۆیەتی سەلامەت بێت.

هەڵشۆ: لە خوا بەزیادبێ کاک کۆژین، گرنگ خۆیەتی، خۆتان سەلامەت بن، ئیشەڵڵا منداڵ هەر دروست ئەبێتەوە.. شوکر هیچ لەژێر دەستانا دەرناچێ، ئیشەڵڵا خوا زوو سڕی ئەو کەسەش هەڵئەماڵێ و بە سزای خۆی ئەگا.

(( هەموو خۆشحاڵیی خۆیان بە مانی بێستان دەرئەبڕن و تریفە ڕائەکاتە ژوورەوەو دواتر کۆژین و تریفە و لەسەر نەقالەیەک بێستان ئەهێننە دەرەوە بە بوراوەیی، یان بە وڕێنەی بەنجەوەو هەر داوای کۆژین بکا))

Cut

دیمەنی – ٥٢٢ – ڕ/ن – ئۆفیسی شۆڕش:

(( شۆڕش و سەرداری قژ ماش و برنجیی تەمەن دەوروبەری ٥٥ ساڵ دانیشتوون))

سەردار (( قاقای پێکەنین)): ئەشهەدوو باش هاتووینەتە دەست لە کەسوکار، من لە برازای خۆم و تۆش لە خوشکەکەت. هههە.

شۆڕش (( پێکەنینی کەم)): سەردار گیان مەسەلە خوشک و برازا نییە، ئەوان ئەو پارەیەیان بە ئیف دەسکەوتووە، دڵنیابە پشتیان پێوە نەیەشاوەو هەر بە فیڕۆی ئەدەن.. جا بۆ ئێمە نەیخۆین؟ لە یەکێکیتر باشتر نیین؟

سەردار: پێم وتی کچەکەت بنێرە ئیشی بۆ بکا، چۆن بوو؟

شۆڕش: هەر زۆر باش بوو.. پارەی دنیام لێ ماشیوەتەوە بەهۆی ئەوەوە، ئەمە تەنها بەناوی ڕیکلامەوە.

سەردار (( گرژ)): کچەکەت ئەزانێ ئەو پارەیە زۆرە داوات کردووە؟

شۆڕش: جا ئەگەر بزانێ چۆن شتی وا ئەکا؟.. ئەو ئەوەی لەسەرە پارەکەم بۆ بێنێتەوەو بەس، بە حساب من کۆمپانیاکانی پرۆداکشن ئەناسم و ئەو پارەیە بۆ ئەوانە.. قابیلە من لە خوشکی خۆم بخۆم؟ هههەه

سەردار: بەڵام زۆر دڵخۆشکەر نییە.. وەک من بکە، دەمێ بە ناوی باج و دەمێ بە ناوی پرۆتۆکۆڵ و .....

شۆڕش: شتەکان هەمووی لەبەردەستی کچەکەمایەو من تەنها پسوڵەی ساختە دروست ئەکەم و هیچیتر، کورە نیازی شتیتریشم هەیە.

سەردار: ئەو چی بابانوێران؟

شۆڕش: نیازی وایە لەسەر ئەرزەکەی خۆیان تەلارێکی پێنج نهۆمیی دروست بکا، منیش ئەمەوێ ئەوەش بگرمە دەست و ئیتر داماوە بە هەزار چنگە کرێ، تا قاتی دووەمی بۆ ئەکرێ و ناکرێ. هههە.

سەردار: دەی بۆ پڕۆژەی تر بگەڕێ، تازە ئەم دووانەمان مسۆگەر کردووە.. بزانە ڕەفیق و برادەر، خزم و ناسیاو، کەسیتریان پێویستیان بە ئەقڵی ئێمەو مانان نییە هەهەهەهەهە.

شۆڕش: هەرچی دۆزرایەوە هەر شەریکییە خەمت نەبێ.

(( پێکەنین و دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥٢٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٥٢٠ – کۆمپانیای زوبێر:

(( ئامۆو ئاوا ))

ئامۆ: ئەبێ ئەمجارە کە بینیت زۆر هێمن بیت و واش نەچیتە چاویەوە سڵت لێ بکاتەوە، مادام مەرامت باشە، هیچ پەلەت نەبێ.

ئاوا: تۆ پێم بڵێ کەی ئەیبینم؟

ئامۆ: ئەڵێی لەسەر پشکۆی برا.. وا نابێ.. بەخوا زۆر هێمن نەبی، ناونیشانی کەسێکیتریان ئەدەمێ.

ئاوا: جا ئەوە لەگەڵ برا ڕوح سوکەکەی خۆت ئەکەی؟ ئەزانم نایکەی، بەڵێن بێ منیش زۆر خۆڕاگر بم.. بەس کەی ئەیبینم؟ پێم بڵێ.

ئامۆ: خۆی تەلەفونت بۆ ئەکا !!!!!

ئاوا: چۆن؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

ئامۆ: ئا.. ژمارەکەی تۆم دانێ.

ئاوا: جا خۆ ئەبورێمەوە.

ئامۆ: نا نا نابورێیتەوە، کەمێک شۆک و دواتر پەیوەندیی و دواتر هاوسەرگیریی و دواتریش شەڕو ئینجا ئەبێ من بێم بۆ ڕێکخستنەوەتان هههه

(( پێکەنین ))

ئاوا: کورە خوا ئەکا ئەوە بۆ من ئەبێ، ئەوەنە موو نەرم ئەبم قژم بە هیچ لایەکا بۆ نەوەستێ، شەڕی چی؟

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی ئامۆو دەست لە یەک خشاندنی ئاوا بە خێرایی و دڵخۆشیی ))

Cut

دیمەنی – ٥٢٤ - ش/ن – ماڵی میری گەورە:

(( میری گەورە بە ئۆقەر لە پشتەوە بە بێ دەمامک، پشتی سەری یان لایەکی نیشان ئەدرێ، بەوجۆرەی نەناسرێتەوە، بە مۆبایل تێل ئەکا ))

پاشا: ئەک عەمرت نەمێنێ یاخوا.. ژنێک، ژنێکت بۆ نەکوژرا خوێڕی، تۆ چیت؟ توخوا بە خۆت ئەڵێی بەشەر؟...... دەمت داخەو بێدەنگ بە هەتیو، قسەی قۆڕ بۆ کێ ئەکەی؟ ئەی ئەتەوێ بێتە بەردەمت و بڵێی ئا توخوا کاک نەجات هەنێ فیشەکم پێوەنێ با نەجاتم بێ؟........... دەمت داخە، قسە لە قسەما نەکەی...... با بزانی، یەک هەڵەیترت لێ ببینم، ئەمجارەیان خۆت کوژراوەکەی، من پیاوی خوێڕی و پاتاڵم ناوێ.. ئەوەی پێموتی بۆ ئەمشەو، هەر کامیان مەترسی گرتن هاتە سەریان، وەک ئەویتر نەجاتی بدە.. هەڵەم ناوێ نەجات.

Cut

دیمەنی – ٥٢٥ – ڕ/ن – نەخۆشخانە – ژووری نەخۆش:

(( بێستان ڕاکشاوەو بێهۆشە.. کۆژین و سەرکۆو ڕاهۆزو تریفەو هەڵشۆ لەوێن.. پاش کەمێک))

سەرکۆ: شوکور وەزعی باشەو خوا دایەوە ڕائید کۆژین.. هەرکاتێ ئێرەت جێهێشت ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بکە بە منەوە، کلیلی خانوویەکی میرییمان بۆ داناوی لای منە، ئیتر ناچیتەوە ماڵەکەی خۆت، پارێزراو نییە.. بەردەوام مۆبایلم کراوەیە هەر ئیشێکت بوو، ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆ دائیرە.

کۆژین: زۆر سوپاس گەورەم، ئەرکتان کێشا.. هەرکاتێ هۆشیشی هاتەوەو لێی دڵنیا بوومەوە، دێمە خزمەتت.

سەرکۆ: خۆت سەغڵەت مەکە، هەرکاتێ دەرفەتت بوو.

کۆژین: بەڵێ باشە.

(( بەڕێکردنی ئەوان تا دەرگای ژوورەکەو گەڕانەوە))

تریفە: ئەوەش مێردەکەمە کاک کۆژین.

کۆژین: ئەرکت کێشا سوپاس. خۆشحاڵم.

هەڵشۆ: لەخزمەتداین گەورەم، هەر شتێ بە من بکرێ.

کۆژین: زۆر سوپاس.

هەڵشۆ: جا ئەگەر ئەمرێکتان بە ئێمە نییە لە خزمەت مەرەخەس ئەبین.

تریفە: من چۆن وا جێی ئەهێڵم، تۆ بڕۆ من لێرە ئەبم.

کۆژین: نا نا تریفە خان تۆش بڕۆ خۆم ئاگام لێی ئەبێ.

تریفە: ئەیڕۆ چۆن شتی وا ئەبێ کاک کۆژین، هەر ئەبێ ئافرەتێکی بەدیارەوە بێ.

هەڵشۆ: نا نا گەورەم با ئەم لێرە بێ، من مەبەستم خۆم بوو.

کۆژین: ئاساییە ئەویش بێت کاکە.

تریفە: نەوەڵا من جێی ناهێڵم.

هەڵشۆ: وا ئەو لێرەیە گەورەم، من لەسەر ئیزنی جەنابت، هەندێ ئیش و کارم هەیە.

کۆژین: فەرموو.

(( خواحافیزیی کردن لە هەڵشۆو ڕۆشتنی))

Cut

دیمەنی – ٥٢٦ – ڕ/ د – دوکانی قصابیی تایەر:

(( تایەرو شەماڵ لەوێن و ئاکار دێت، پاش کەمێکیتر برزۆش، سڵاو و وەڵام))

تایەر: گەیشتینە کابرای ماتۆڕسوار.. ئەمشەو دایئەدوورین.

شەماڵ: ئادەی چۆن؟

تایەر: شاخە پێیوتم ئەمشەو ئەچن بۆ دزیی و حەتمەن ماتۆڕ سواریش دێت بۆ چاودێریی کردنیان.

ئاکار: هەر زۆر باشە، بەڵام نایکوژین حمەتایەر.

تایەر: ئەی خۆ خەڵاتیشی ناکەم؟

ئاکار: برا خەڵاتی ناکەین، ئەیگرین و ئەشکەنجەو ئازارێکی وای ئەدەین، پێمان بڵێ کێ ڕایسپارد ئەوە بکا.. ئەی خۆ ئەبێ بزانین کێ ئەوەی پێکرد؟

شەماڵ: ئەگەر ناچاریش بووین، زرمەی لێ هەڵئەسێنین.

تایەر: بەدڵمە.. بەڵام بۆ ئازاردانەکەی کەس نایەت بەلاما.. بیللاهی خوێ ئەکەم بە برینیا.

ئاکار: ئەوە دوایی ئەزانین چی لێ ئەکەین، ئەوەی گرنگە ئێستا بزانین بۆ چ گەڕەکێک ئەچن؟

برزو: بەڕای من ئەگەر پۆلیس لەو شوێنەوە نزیک بێ، وا بکەین ڕووەو پۆلیسی ڕاو بنێین و ئەوان بۆمان بگرنەوە ئەگەر لە دەستمان دەرچوو.

شەماڵ: توخوا ئەگەر دەمت دانەخەی ئیفلاتون (( هەردوو دەستی ئەخاتە قژی برزووەوە)) ئەوە چییە ئەو ئەقڵە موهیمە، ئەقڵت بخۆم.

Cut

دیمەنی – ٥٢٧ – ڕ – عەسر/ د – ژێر دارێک:

(( پاشا شانی بە دارێکەوە داداوە، دەموچاوی نیشان نادرێ، تێل ئەکا ))

پاشا: سبەی شەو دێن بە شوێنتاو ئەتهێنن بۆ لای من........... باشە دەی، بۆ ئەوەی ئەمشەو چی ئەکەن؟................. هەڵەم ناوێ تێگەیشتی شاموراد......... باشە، کە تەواوبووی ئاگادارم بکەرەوە.

(( ئەم مۆبایلەیان تەواو دائەخات و ئەیخاتە گۆرەوییەکانییەوە ))

Cut

دیمەنی – ٥٢٨ – ش/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو گێلاس))

ئاکۆ: باشە ئەگەر وابێ، ماوەیەکیتر میوانی زۆر ڕووتان تێئەکەن.. شۆڕش ئاقڵە، ئەزانێ میوان لە کوێوە ڕوو ئەکاتە ئەمشارە، لەو شارو وڵاتانەوە ڕیکلام بڵاوئەکاتەوە.

گێلاس (( سست)): بەس زۆر زۆری تێچوو.

ئاکۆ: ئەی وایە، ئەویش کۆمپانیایە، خۆ بە خۆڕایی ناوبانگ بۆ ئوتێلەکەت پەیا ناکا.. گرنگ نییە هەر سەرەتاش ڕێکلامت پێویستە، جاریتر ڕێت تێی ناکەوێتەوە. ئەی لەگەڵ کوڕەکانی نارەوەن.

گێلاس: زۆر باش هاتوون و هاوکاری باشیان کردم، بە تایبەت ئاوا، هەر توایەوە.

ئاکۆ: وابزانم ئەو ساختەچییە چاوی لەسەر نینایە.

گێلاس: هەر چاو؟ کوره هەموو گیانی بوو بە چاو کە بینیمان.. ئەوەی بۆ کردووین نەکراوە بێ.

ئاکۆ: هەه جا ئەگەر مەبەستی خراپ نەبێ، قەیچێکا.

گێلاس: نا نا قەی ئەکا ئاکۆ گیان، چۆن برازای خۆم ئەدەم بە کوڕی دارەوان، هەرچۆنێک بێ خەڵک ئەڵێ باوکیان لە سێدارەدراوە.

ئاکۆ: ئەوە پەیوەندیی بە من و تۆوە نییە، یەکەم کچە خۆی و دووەم باوکیشی لە ژیانایە، خۆیان بڕیار ئەدەن.

گێلاس: نا نا قەت پەیوەندییش دروست ناکەن... نینا ئەیوت جا من هەرکەسێک موعجیبم بێ و دەرگای بۆ بکەمەوە، ماڵەکەمان پڕ ئەبێ لە موراجیع هههه

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٥٢٩ – ش/ن –ماڵی حەمەخدر:

(( حەمە خدر و نارەوەن))

خدر: باشتکرد پرست پێ کردبوو.. هیچ شتێک بە بێ پرسی ئەوان نەکەی باشترە، وا نەزانی ئیتر ئێمە بۆمان هەیە بە ئارەزووی خۆمان هەڵسوکەوتکەین، باوەڕکە چاودێری لەسەر ئێمەش هەیە.

نارەوەن: ئەی چۆن ئەوە باش ئەزانم.. ئێ با هەر چاودێریی بکەن، بۆ ئێمە زۆر باشترە چونکە دڵنیاتر ئەبنەوە لە ئێمە، وەڵا من هیچ باکم نییە.

خدر: ئەوەی ئێستا لەسەر ئێمە پێویستە، دۆزینەوەی ماتۆڕسوارەکەیە.. ئێمە لە میسر بووین یەکێکی لای ماڵی ئێوەوە کوشتووەو ئەمڕۆش یەکێکیتر.. کەواتە ڕەنگە نزیک بێ، لەم ناوچەیەی ئێمەوە کە ڕائید کۆژین سەرپەرشتیمان ئەکا.. ئەو کەسە ئەیەوێ ماندووی بکات و دەست لەم کەیسە هەڵگرێ.. بۆیە ئەبێ وریاتر بین.. بەڵام کە تۆش ئاوا بخزێیتە ماڵەوە، هیچ بە هیچ ناکەی.. هەوڵ بە بێیتە دەرەوە.

نارەوەن: بۆ حەز ناکەم؟ کورە خەریکە دڵم ئەتەقێ، من فێرە دەرەوە بووم، تازە ناتوانم لەماڵەوە ئۆقرە بگرم.. ناشزانم چۆن چارەسەری بکەم.

خدر: بەم شێوەیە هیچ زانیارییەکت دەست ناکەوێ و لای ئەوانیش وا باش نییە.. ڕەنگە تۆ بتوانی بگەیتە ئەنجامێکی باش.. تۆ زۆر وردی لە لێکدانەوەتا.

نارەوەن: با بزانین ئەتوانم چی بکەم؟.. ئەگەر لە پشتی تۆو ئامۆو ئاواشەوە ئیش بکەم هەر شتێکم دەست ئەکەوێ، مەرج نییە لە پێشەوە بم، ئەوە ڕەنگە هەر باشیش نەبێ.

خدر: دەی ئیتر خۆت وریای، شتێک بکە.

نارەوەن: ئینجا با من بڕۆم، کچەکە تەنیایە.. دەمێکە لێرەم.

خدر: باشە، بڕۆ.. ڕاست ئەکەی. (( بەڕێکردن و خواحافیزیی))

دیمەنی – ٥٣٠ – ش/ د – بەردەمی ماڵێکی گەورە:

Mute

(( سەیارەکەی شاموراد لەم دیوی ماڵەکەوە.. کەمێک لە دوور ئەوەستێت و شاخەو ئدریس دائەبەزن، دیقەتی ئەملاولا ئەدەن و ئەچنە حەوشەی ماڵەکەوە.. ماتۆڕەکە دێت و لە پشتی سەیارەکەی شامورادەوە، بە مەسافەیەک ئەوەستێ.. سەیارەکەی تایەریش ڕووبەڕووی سەیارەی شاموراد دێت و لەو دیوی ماڵەکەوە لە دوور ئەوەستێت، واتە ماوەی زۆر ئەکەوێتە نێوان ماتۆڕو سەیارەی تایەرەوە.. ماتۆڕەکە هەڵوێستە ئەکات و بە کوژاوەیی ماتۆڕەکەی ئەخاتە پشتی بەرمیلێکی خۆڵەوە کە دانراوە.. ئەگەر بەرامبەرەکەی ئەو ماڵە جەزرە وسطی بێت باشترە))

ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ٥٣١ – مربوط – ش/ د – ناو سەیارەی تایەر:

(( تایەرو ئاکارو شەماڵ و برزو))

برزو: ئەڵێم دابەزین باشتر نییە؟

شەماڵ: بۆ قورمساغ؟

برزو: ئەی ئەڵێم با فریای تەقە بکەوین.

شەماڵ: بۆ لێرەوە کێ دەستی گرتووی؟ یان ئەتەوێ دابەزین و خۆمان ئاشکراکەین؟

تایەر: هەتیو دە بەسیەتی قسە، گوێ بۆ دەنگی ماتۆڕ هەڵخەن.

(( پاش ماوەیەکی کەم))

ئاکار: ئەوە دەرگای ماڵەکە کرایەوە، ئەها ئەها ئەوە شاخەیە، کۆڵێکی پێیەو دێتە دەرەوە، ئەیبینن؟

تایەر: ئەرەوەڵا ئەوە شاخەیە.. ئەوەش ئدریسەکەیە.

شەماڵ: لە ئێستا بە دواوە ئیتر ماتۆڕەکە پەیا ئەبێ ئەگەر بێت.

برزو: وایە.. من ئەڵێم بەدوای ئەمانا بڕۆین باشە، چونکی ماتۆڕسوارەکە دوایان ئەکەوێ.

شەماڵ: باش!

تایەر: وا چوونە ئەو سەیارەیەوە، دیارە سەیارەی شامورادەکەیە، ئەی کوا ماتۆڕ؟

ئاکار: چاوەڕێ ئەکەین.

(( سەیارەی شاموراد دێت و بە بەردەمیا ئەڕوا.. پاش کەمێک ماتۆڕسواریش بە ئاراستەی پێچەوانەوە، زۆر بە خێرایی لەو دوورەوە دەرئەچێ))

برزو(( بەپەلە)): ئەوەتا تایەر تایەر دوایکەوە.

شەماڵ: ئای لەو زۆڵە، لەکوێیا خۆی حەشاردابوو.

(( تایەر سلف لێ ئەدا ))

ئاکار: خۆت سەغڵەت مەکە، ئەو فڕی، فریای ناکەوی.

(( سەیارەی تایەر بە خێرایی بەو شوێنەدا ئەڕوا، بەڵام ماتۆڕ دیار نامێنێ ))

Cut

دیمەنی – ٥٣٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای زوبێر/ژووری زوبێر:

(( ئاوا تێل ئەکا ))

ئاوا: لەبەر دەرگای نینا خان؟ ئەی بۆ نایەیتە ژوورەوە، ئەگەر نایەی وا من دێم.... باشە بەخێر بێی یاخوا.

(( ڕائەکا بۆ دەرەوەو لەگەڵ نینادا دێنەوە ژوورەوە، نینا پێش ئەخات و خۆی لە دواوە، بە پەلە دێت و لە سەلاجە ئاو و چکلێتی بۆ دەرئەکات و لە بەردەمی دایئەنێ، شڵەژانی پێوە دیارە ))

ئاوا: یاخوا بەخێر بێی سەرچاوم، زۆر بەخێر بێی.

نینا: سوپاس.. جەنابی ئەفسەر، لیستی پێداویستیی ئەمڕۆم هێناوە (( ئەیداتە ئاواو پێکەنین )) باوکم بە وەڵامەکەت زۆر سەرسام بوو.

ئاوا (( لیستەکە ئەخاتە سەر مێزەکە )): کچێ من بە باوکت و بە قسەکانی و بەخوا بە کچەکەشی سەرسام بووم.

نینا: ناترسی بێت چوار شەق و زللەت تێسرەوێنێ؟ بیرت چووەوە پۆلیسی ئادابە؟ (( پێکەنین ))

ئاوا: کچێ ئەسڵەن من بۆ شەق و زللەی باوکت خوڵقاوم.

نینا: تۆ هەر کچێک ببینی ئاوا بێ شەرمانە دیقەتی ئەدەی؟

ئاوا: نەوەڵا بە ژیانم وا نەبووم.. بەڵام تۆ خۆت بینیوە زاڵم؟ بەڕای من هەر کەس بتبینێ وات بۆ ئەکا.

نینا: وایە، بەس هەموو کەسێک نا.. جاروبار یەکێکی وا هەڵئەکەوێ.. بەڵام پێم خۆش نییە.. من ئەمەوێ کەسێک لە ناخم بگا ئەوسا هەستی سەرسام بوون دەربڕێ، نەک بە جوانییەکەم تێ بکەوێ و دواتر پەشیمان بێتەوە.. جوانیی تا سەر نامێنێ، بەڵام جوانیی ناخ بەردەوام ئەبێ.

ئاوا: زۆرجار ناخ لە ڕوخساردا ڕەنگ ئەداتەوە، ئەو شەوە بە جۆرێک خەندەت کرد، من یەکسەر نەک هەر ناخت، بەڵکو پشتی ناخیشتم خوێندەوە، کە چەند کەسێکی باشیت.

نینا(( هەڵئەسێتە سەرپێ)): ڕوخسەتم بە پێت بڵێم درۆ ئەکەیت (( ئاوا کەمێک حەپەساو)) ئەزانی درۆکەت ڕێک لەو درۆیە ئەچێ، کە بە باوکمت وت لە تەعزێکە بینیومیت هههه.

ئاوا: ڕاست ئەکەی، ئەو درۆیەم بۆ نزیک بوونەوە لە باوکت کرد.

نینا: ئەم درۆیەشت بۆ ڕەزامەندیی نیشاندان بوو لەسەر قسەکانم، تا دڵی منی پێ ڕازیی بکەیت.

ئاوا: نا.. ئەمەیان درۆ نەبوو.

نینا: با درۆ بوو کوڕی باش، چونکە زۆر کەس پێیان وتووم خەندەت زۆر جانانەیەو دڵ ئەبات، زۆرکەس بە خەندەکەم سەرسامە.. تۆش هەروا.. ئەگینا ئەسڵەن خەندەکەم ڕاهاتنە نەک ڕەنگدانەوەی ناخم.

ئاوا: بە ڕاستی لەبەردەمی هیچ کچێکا ئاوا دەستەوسان و بێ وشە دانەماوم، بەوەدا ئەزانم ئەتوانین لە یەکتر تێبگەین و ڕێککەوین.

نینا: ئەمەشیان هەر باوەڕ ناکەم.. چونکە من بڕیارمداوە پەیوەندیی لەگەڵ کەسا نەبەستم.

ئاوا: ئێهـ کەواتە بڕیارەکەت ئەگۆڕین بۆ پەیوەندیی ئاشکرا. با هەموو دنیا بزانێ.

نینا: مەبەستت چییە؟

ئاوا: ژمارەکەی باوکتم بدەرێ بزانم لە کوێیەو هەر ئێستا داوات ئەکەم.

نینا: هەروا بە خێرایی بڕیارتدا ئەی پیاو؟ ئەها کچێک توانی چیت پێ بکا؟

ئاوا: من دڵنیام تۆ زۆر خراپتریشم پێ ئەکەی..

نینا: چیت لە من ئەوێ؟

ئاوا(( بە گاڵتەوە بە ڕەسمیات)): ئەمەوێ لەگەڵ تۆدا هاوسەرگیریی بکەم بەڕێز.

نینا(( پێکەنین)): تۆ سەیریکە ئەڵێی لەبەردەمی حاکما وەستاوە بۆ مارە بڕین.

ئاوا: بەڵێ ئەمە پرۆڤەیە.

نینا: با راستییەکت پێ بڵێم کاک ئاوا.. مانەوەی من کە شووم نەکردووە تا ئێستا، پەیوەندیی بە جوانیی و غرورەوە نییە کە زۆرکەس وا تێ ئەگا.

ئاوا: بۆ ئەمە هێشتا مەغرور نیت؟ قوڕەکەی دنیا بەسەری من!

نینا: نا غرور نییە.. هەموو ئەو کەسانەی لە من هاتوونەتە پێشەوە، بڕیاری خێرایان داوە، منیش بە سروشتی خۆم، لە بڕیاری خێرا ئەترسم.

ئاوا: ئەو کێشەیەشت بۆ چارەسەر ئەکەم.

نینا: چۆن؟

ئاوا: گوێ بگرە... (( زۆر بە خاویی)) من ئاماوێ لەگاڵ تۆدا هاوسارگیریی بکام نینا خان. (( نینا پێ ئەکەنێ)) ئەها ئەمجارە بڕیاری خێرام نەدا، توخوا خۆت بڵێ چەند خاو بوو.

نینا: جا لەگەڵ تۆیا ئەوە هەر مەحاڵە.

ئاوا: بۆ دڵەکەم؟

نینا: کورە دڵی چی کوا تۆ دڵت هەیە؟ تۆ شێتیی! بەخوا تەواو نیت هههە.. شتەکانم بۆ بنێرەو من بای. (( نینا ئەڕوات))

ئاوا: دوای ئەکەوێ کچێ وەرە هەی شێت و وێت بگەڕێوە قسەم زۆر ماوە.

(( ئاوا ئەچێتە دەرەوە بەدوایا))

Cut

دیمەنی – ٥٣٣ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆزو کۆژین غەمبارەو بە پێوەیە))

ڕاهۆز: بەڵێ گەورەم بەداخەوە پاشا هەیە.. دوور نییە دارەوان ڕاستی کردبێت.

سەرکۆ: نا، دارەوانیش دەستی لە زۆر تاواندا هەبوو، تەنانەت بە ژنەکەی وتووە زۆر کەسی تریشم کوشتووەو زۆر تاوانی تریشم کردوون، خۆتان بۆتان دەرئەکەوێ، لەو کەیسەدا بە گومانا مەچن. ئەو بە سزای خۆی گەیشت.

ڕاهۆز: بەڵام گەورەم ئەم پاشایەش هەمان ئەو دەستوری بینینەی هەیە کە ڕێشار باسی کردو دارەوانیش دانی پیانا.

سەرکۆ: نەقیب ڕاهۆز، ئەوە مانای بێ تاوانیی دارەوان نییە، بەڵکو ئەوە لوغزەو ئەبێ بیدۆزینەوە.

کۆژین: گەورەم ئەکرێ ئەو کەیسەیان بدرێ بە من؟

سەرکۆ: نا ڕائید کۆژین.. شتەکان بە شخصیی ناکەین.. تۆ ئێستا بریندارییت، خۆت وتت سایکۆلۆژیای مرۆڤ ئاڵۆزە.. ئەو تەقە کردنە لە خانمی بەڕێزت تۆڵە کردنەوەیە لە تۆو تۆش پێش من پێشبینیی ئەوەت کردبوو.. بەلام تۆ چاوت ئەوەندە لەسەر نارەوەن بوو، کە کەسوکاری ڕێشارو ئەوانیتری دارەوان و سەرەو مالەیان لا کەمبایەخ کردبوویت.. ئەوەتا برای ڕێشار لە گروپی پاشایە.. بەڵام هەموو ویڵن بۆ ناسینی ماتۆڕسوارەکە، بەو دزانەی لای براکەی ڕێشاریشەوە.

ڕاهۆز: گەورەم زۆر ڕێی تێ ئەچێ ئەو ماتۆڕسوارەی تەقەی لە بێستان خان کردووە، هەمان کەس بێت لەبەر ماڵی نارەوەندا دزەکەی کوشتبێت.. تا ئێستا هەواڵی یەکلاکەرەوە نییە، لەبەرئەوە ڕاپۆرتەکەم دوا ئەخەم.

کۆژین: سوپاس گەورەم بۆ بەخشینی ئەو خانوەی میریی.

سەرکۆ: سوپاسی ناوێ ڕائید کۆژین، تۆ لەوێ بمێنیتەوە ئەمجارەیان خۆت ئەکرێیتە ئامانج، ئەبێ بپارێزرێی، پاسەوانیشت بۆ دانراوە خەمی هیچت نەبێ.

ڕاهۆز: گەورەم کارەسات لەوەدایە گەر براکانی دزە کوژراوەکە بگەنە ئەو پاشایە، پێش ئەوەی دان بە هیچدا بنێ ئەیکوژن.

سەرکۆ: بەردەوام لە حاڵەتی ئامادەباشیدابەو هەرکاتێ زانیت ڕێگەی ئەدۆزنەوە، پێشتر هێز بجولێنە.. لەبەر ئەوەی کارەکە کتوپڕییە، ئەتوانین دەسەڵاتەکانی پۆلیس بەکار بهێنین و دواتر ڕەوانەی پۆلیسیان بکەین، ئەمە باری نائاساییە.

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم..

سەرکۆ: تۆ بچۆ بەلای خانمەوە ڕائید کۆژین.. ئەم ماوەیە دۆسیەکە بدە بە ئەفسەرێکیتر، یان هەر با لای نەقیب ڕاهۆز بێ.

کۆژین: ئەم باشتر سەری لێ دەرئەکا گەورەم.. ئەیدەمە نەقیب ڕاهۆز.

ڕاهۆز: گەورەم پێشنیازێکم هەیە، گەر ئەو کوڕە گەنجانەش پاشاکەیان بۆ نەدۆزرایەوە، پێم باشە پۆلیس ئاگادار بکەینەوە لە کاتی سەردانیی شاموراد بۆ لای پاشاو لەو کاتەی پیاوەکانی ئەو ئەبینێ، هێرش بکرێتە سەریان.

سەرکۆ: لەو کاتەدا یەک دوویەک ئەبن، یان بە تەلەفون ئەو ئاگادار ئەکەنەوە شوێنەکەی جێ بهێڵێت، یان تا کوشتنیان شەڕ ئەکەن و هەموو سەرەداوەکان ون ئەبن.. ڕێگەی ئەو گەنجانە بدەن با بۆ تۆڵە بگەڕێن، تا پاشاکەمان بۆ ئەبیننەوە.

کۆژین: بەڵێ بەوە ئەگەینە شوێنی پاشاکەو بە زیندوویی دەسگیر ئەکرێ.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٥٣٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و شۆڕش و نینا ))

گێلاس: ئاخر ئیتر بەرگە ناگرێ، ئەو پارەیەی بۆ ئەم ئوتێلەم دانابوو تەواو بوو، بڕوا بکە لە پارەی دانراوی تەلارەکەشم دەرهێناوە.. ئیتر ڕیکلام بوو بە چی؟ کەسیش هەر نایەت، وا ئەبێ کرێیەکیتریش بدەم.

شۆڕش: ئەم ئیشانە پشوو درێژییان ئەوێ خوشکەکەم، ئەی بۆ پێموتی تۆ ئاگاداری بازاڕ نیت، بۆ تۆ زەحمەتە، خۆ یەکەم قسە بە شایەتی مێردو کوڕەکەت ئەوەم پێوتی.

گێلاس: ئەزانم براکەم بەڵێ واتوت.. بەڵام دوێنێ بە نمونە، بایی ١٠٠٠ دۆلار شمەکی خۆراک هاتووە، کە زۆر هاوکاریش کراوین بە هۆی ئاوای نارەوەنەوە، باوەڕ ئەکەی بیکەیتەوە بە دۆلار دەخیلەم هەر ٣٠٠ تا ٣٥٠ دۆلار بوو.. ئیتر سەرپاکی ئەوەی مایەوە فڕێدراوە.. من دڵم بە ڕیکلامەکە خۆش بوو.

شۆڕش: تۆ گوێت بە تازەیی شوێنەکە نەداوەو دەسبڵاویی زۆرت کردووە.. جگە لەوەش هەموو ئەو شوێنە ڕاقیانە لە سەرەتاوە زەرەرە تا سەرپێی خۆی ئەکەوێ.

نینا: ئەو ئاوایەش پێی وتین زۆرتان داوا کردووە، پورە گێلاس بە قسەی نەکرد.

شۆڕش: ئێ، بەڵکو ئەو ئەفسەرە شارەزا بێ، ماوەیەک بە قسەی ئەو بکەن. (( نینا بزە ))

گێلاس: کورە ئەفسەری چی؟ بۆ سوعبەت وتی ئەفسەرم، زۆر قۆشمەچییە.

شۆڕش: ئەزانم خوشکێ.. باشە ئێوە بانگی بکەن بۆ ئێرەو باشوێنەکە ببینێ و دەستی پێتانەوە بێ، تا ئەگەنە سەر سکە.

نینا: وەڵا ئەمڕۆش بایی هەزاری تر داواکراوە.

شۆڕش: ئەگەر نەگەیشتووە، پێی بڵێن کەمتر بنێرێ.

نینا: پێی بڵێم پورە گێلاس؟ ___________ Cut ___________

دیمەنی – ٥٣٥ – ڕ/د – بەر ئۆفیسی وەکالەت:

(( حەمە خدر لە سەیارەکەی دائەبەزێت، بەرەو ئۆفیسەکە دێت، لەگەڵ هەڵشۆدا ڕوویان ئەتەقێ بە ڕووی یەکدا))

خدر: باشیت کاک هەڵشۆ؟

هەڵشۆ (( بەدەم ڕۆشتنەوەو اهمال کردن)): بژیت. (( ناچێتە ئۆفیسەکەو ئەگەڕێتەوە بۆ سەیارەکەی، کە لە پێش ئەوەی خدرەوە ڕایگرتووەو ئەڕوا، خدر ئاوڕی بۆ ئەداتەوەو گاڵتەی پێدێت))

(( خدر ئەچێتە ژوورەوە کە هەڵشۆ لە چاو ون بووە.. پێش تەواو چوونە ژوورەوەی، تریفە ئەگاتە بەر ئۆفیسەکە))

تریفە: کاک حەمە خدر کاک حەمەخدر!

خدر(( ئاوڕ ئەداتەوەو دێت بەرەو پیری تریفەو پاش سڵاو و وەڵام)) فەرموو خوشک گیان.

تریفە: دایکم لەوێیە؟

خدر: نەوەڵا لێرە نییە.

تریفە: ئەی کێی لێیە؟

خدر: هەر منی لێم، تریفە خان ئەمرکە.

تریفە: نا زۆر سوپاس، ئیشم بەوان هەبوو زۆر سوپاس برا گیان. (( نارەوەن پەیا ئەبێ)) باش بوو ئەوە خۆیشی هات.

(( سڵاو و وەڵام))

تریفە: دایکە ئەمشەو هەڵشۆ لای ئێوە نەبوو؟

نارەوەن: نا.. هەر زۆر دەمێکیشە نەمبینیوە.

خدر: پێش پێی تۆ ئەو ڕۆشت، سڵاویشم لێکرد.

تریفە(( دەست بە سنگیا ئەهێنێ)): ئۆخەیش، ماڵت ئاوا بێ کاک خدر دڵنیات کردمەوە.

خدر: بۆ لە دوێنێی نەخۆشخانەکەوە سۆراخی نازانی؟

تریفە: نەوەڵا، ئەوە چەند شەوێکیشە هەر زۆر دوا ئەکەوێ.

نارەوەن: دواکەوتنی تا چەند؟ من لێی قبوڵ ناکەم.

تریفە: وەڵا دایکە ئەم چەند شەوە ئیتر شەوی وا هەیە سێ و چوارو ئیتر وای لێهاتووە.

خدر: ئۆو.. خۆ هیچ دوکان و بازاڕێکیش نامێنێ ئەو کاتانە.

تریفە: بەخوا وتم ڕەنگە هەر لەگەڵ ئێوەیا بێ گوێم نەئەدایێ، بەڵام ئەمشەو کە نەهاتەوە، ئیتر ترسم لەبەر نیشت.

نارەوەن: چۆن ئەکرێ ژنێکی ئاوا جوان و جاهێڵ بە تەنیا لە ماڵەوە جێهێڵرێ؟ دنیا هەزاران دزو درۆزنی تیایە بابە.. ئێستا تەلەفونی بۆ ئەکەم هەر ئابڕووی ئەبەم.

تریفە: نا توخوا دایە لەبەر من!

خدر: مەکە.. لەبەر کچەکەت مەکە، با سەری لێ نەشێوێ.. فەرموون فەرموون با بچینە ژوورەوە.

(( هەموو پێکەوە ئەچنە ژوورەوە))

ـــــــــــــ ربط ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــ

دیمەنی – ٥٣٦ – ڕ/ن – دوکانی لەنگە:

(( شاموراد دانیشتووەو شاخە بە پێوە لە بەردەمیاو ئدریس سەرقالی مشتەری))

شاموراد(( بە دنگی نزم تا مشتەرییەکە ئەڕوا)): شاخە ئەم پاشایە ئامانی نییە، پیاو کوشتن و ئاو خواردنەوەی لا یەکە.. خوا ڕێشاری برام بگریێ توشی کردم، من کەی ئەهلی ئەم پیاوکوژو سەرسەرییانە بووم؟.. ئەو وتی ئیشێکی خۆش و ئاسانەو بەس وریای خۆت بیت و نەگیرێی، ئەبی بە ملیۆنێر.. ئای خوایە من بۆچی هاتم و توشی چی بووم؟

شاخە: وەڵڵاهی گەورەم منیش هەر بۆ دزیی و بژێوییەکە هاتم، کەچی ئێستا وا پێمان لە قوڕەکەیا گیر بووە، هەر نایەتە دەرەوە، ئێستا بلێم واز ئەهێنم، شەوێ کوژراوم. (( مشتەرییەکە ئەڕوا))

شاموراد: نەوەڵا قەت ناگەیتە شەو.. ئەی چی بکەین؟ ئدریس ئەڵێ چی؟

شاخە: وەرە ئدریس خۆ گەورەم لە من و تۆ بێزارترە.

شاموراد: ئەمشەو بانگی کردووم، بە خوا بەخوا ڕوح پێم ڕازیی نییە.. لەوانەیە بڕۆم و نەگەڕێمەوە.

# (( ئەڵقەی بیست و شەش))

ئدریس: نا ئیشەڵڵا هیچ نابێ.. چارەسەرەکەشی لای برادەرێکمانە، ئەڵێ ئەگەر بمهێننە ڕیزی خۆتانەوە، من ئەگەمە ئەو پاشایەی کە کەس نایگاتێ.

شاموراد: برادەرتان کێیە؟

شاخە: کەسوکاری زایەری ڕەحمەتیە، بەدوای تۆڵەدا ئەگەڕێن.

شاموراد(( بە خۆشیەوە)): دە بیهێنە کوڕم بیهێنە، بەڵکو سا ئەمە خوایە بیانکوژن و ئێمەش ڕزگارمان بێ.

شاخە: دەی وەڵا خەمت نەبێ، هەر بەیانی دوکانمان کردەوە لێرەیە.. ناوی ئاکارە.

شاموراد: ئەی ناڵێ چۆن ئەیگەمێ؟

شاخە: هیچ ناڵێ، هەر ئەڵێ بمهێننە لای خۆتان و هەقتان نەبێ.

ئدریس: ئێمە هەقمان چییە چۆن ئەیگاتێ؟ گرنگ ئەوەیە شەڕەکە بەوان ئەکەین، ئەمە خوایە بیگاتێ و وەک سەگ بیتۆپێنێ.

شاموراد: ئامان ئامانە وریای دەمتان بن لای کەس قسەتان لێ نەکەوێ و نەیدرکێنن.. بیللاهی سوسەیەک بکا پێستمان ئەباتە دەباخانە.

شاخە: هیچ خەمت نەبێ، ئێمە هەرچی هەیە بەو کوڕەی ئەڵێین و (( دەست ئەگرێ بە دەم و چاوییەوە)) نە هیچمان وتووەو نە هیچیشمان بینیوە.

شاموراد: ئافەرین.. دەی من ئەچمەوە بۆماڵەوە، نەک ئەمشەو بکوژرێم، با توخوا لە بینینی ماڵ و مناڵ چاوم پڕ بێ.

(( ڕۆشتنی شامورادو خواحافیزیی و شاخە تێل ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٥٣٧ – مربوط – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو نارەوەن و خدر دانیشتوون))

تریفە: هەر خۆشم حەزمکرد سەرێکتان لێ بدەم، بیرم ئەکردن، ئەوە ئامۆ لە کوێیە؟

خدر: هەندێ ئیشی فەرمانگەو شتی وای هەبوو، ئیمزای ئەویان ئەویست.

نارەوەن: ئیمزای ئەویان بۆ چییە؟هەهە خۆ ئێرە بە ناوی ئەوەوە تۆمار نەکراوە؟!

خدر: نا ئیشی وەکالەتەکەیەتی لەگەڵ کۆمپانیاکەی میسرا.

تریفە: باشە ئەی تۆ بۆ سەرێکم نادەی دایە؟ وا ئەوان بە ئیشەوە خەریکن تۆ چی؟ لە ئێستا دەستبەتاڵتر نابی.

نارەوەن: کچێ ئەوەندە بە پەتی کورت کورتەوە بەستراوینەتەوە، بڕوا بکە بۆمان ناکرێ لەوە زیاتر هەنگاو بنێین.. ئێستا گلەیی لە کەسیش ناکەم، چونکە هەموو ئەو پەتە کورتانە لە قاچمانایە.

تریفە: ئەی بۆ هەڵشۆ بە هەموو لایەکا ڕائەگا ماڵی خۆمان نەبێ؟ هەهە

نارەوەن: ئەرێ ئەڵێن کچ ئەداتەوە سەر دایکی، خۆ نەیانوتووە زاواش ئەداتەوە سەر خەزووری؟ (( پێکەنینی هەموو)) سەیرە ئەم کابرایەش بووە بە دارەوان، وەڵا هێشتا ئەو باشتر بوو، هەموو شەوێ ئەوپەڕی ١٢ ، ئیتر لە ماڵەوە بوو.

خدر: هەڵبەت ئیشێکی گرنگی هەیە.......

تریفە: من لە شتیتر ئەترسم کاک حەمە خدر گیان، ئیش بە ڕۆژ ئەکرێ نەک سێ و چواری دەمەو بەیان.

نارەوەن: جا وەڵا مەگەر نارەوەن مردبێ، ئەو بە پارەی ئێمە بژی و لەولاشەوە لە کەیف و سەفایەکیترا بێ.

خدر: نا نا بەو هیوایەی کێشەیەکی بچووک بێ و زوو بگەڕێتەوە ماڵەکەی.

تریفە: گەڕانەوەی چی کاک حەمە خدر.. باوکم یادی بەخێر ئەو قاوەخانەیەشی بۆ کردینەوە، باوەڕ بکە هەفتەیەک پێکەوە بەڕێوەمان نەبرد، بەسەرما بەجێی هێشت و تێی تەقان، لەوکاتەوە میوانی ماڵی خۆیەتی.

نارەوەن: ئەوەیان خەتای خۆتە تریفە، زوو پێموتی ئەوەندە لە قاوەخانەکە مەمێنەوەو ئاگات لە ماڵەکەت بێ، ئەی کە تۆ سەعات ١٢ و یەک بچیتەوە بۆ ماڵەوە، خۆ ئەویش قازی کوێر نییە بە تەنیا لە ماڵەوە دانیشێ. ئەوەیان حەق بڕۆین، تۆ بەرت بۆ بەرەڵا کرد.

تریفە: دەی چی بکەم؟ قاوەخانەش ئەدەیتە دەست هەر کەسێکەوە، بە نیوەناچڵیش شوکرم بۆم بگەڕێتەوە، ئەوەش ناهێنێتەوە.. هەڵشۆش وەک سوێندی لێ خواردبێ، هەر ناچێ بەلایا.. مەگەر ئیشێکی پێم بێ و بێت.

نارەوەن: من نازانم بۆچی باوکت ئەمەی بۆ کڕین؟ بە ڕاستی ئەوە یەکێک بوو لە ئیشە هەرە سەقەتەکانی.. ئەو ئیشانە یەکەمین شتێک کە ئەیکا، دابڕینی ژن و مێردە لەیەک، بە تایبەت بۆ ئێوە.. ئەوەتا ببینە چیتان بەسەر هاتووە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥٣٨ – ڕ/ د – حەوشەی زیندان:

(( زوبێرو ڕێژوان))

زوبێر: باشم باوەگیان.. باش ڕاهاتووم، ئەو ڕۆمانەی هێنابووت هەر زوو تەواوم کرد، سێ جارم خوێندەوە.

ڕێژوان: خۆزگە ئەو تاقەتەی تۆم هەبووایە، وتم چونکە تۆ ئەیخوێنیتەوە، منیش پێشتر بیخوێنمەوە، کەچی دە لاپەڕەم بۆ نەخوێندرایەوە.

زوبێر: ڕێژوان گیان ئەم هەڵایەی بۆ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەکرێ، بیدعەی سەرمایەدارییە باوە گیان، بە جۆرێک گەنجی ئالوودە کردووە، کە نەتوانێ لێی دوور بکەوێتەوە.. تۆ وا ئەزانی لە ڕێگەی تۆڕێکەوە زانیاریی گرنگت دەست ئەکەوێ، بۆ نموونە لەسەر تەندروستیی.. ئەزانی هەندێکیان بە هەڵەدا بردنە؟

ڕێژوان: ئەی باوکە پڕە لە ڕێنمایی تەندروستیی و زانستیی و ئەدەبی و جا چی نا؟ ڕاستیەکەی باوی کتیب خویندنەوەش نەماوە.. هەر کتێب و هەر ئەلکترۆنییات؟.. ئیتر چۆن بە هەڵەدا ئەبرێم؟

زوبێر: ئەو لۆژیکەی تۆ قسەت پێکرد، لە هەناوی ئەو سیستمەدایە کە باسمکرد.. بێ ئەوەی بەخۆت بزانی ئەوان فێرت ئەکەن، ڕەواجیان بۆ پەیاکەی.. تۆ ئەزانی ئەوەندەی سەرسنگی کچێکی شۆخ و شەنگ گەنج لە خۆی کۆ ئەکاتەوە، هیچ بابەتێکی مرۆڤایەتیی ئەوەندەی لە چواردەور کۆنابێتەوە؟

ڕێژوان: ئەوە ڕاستە، ئەوەش هەر ئەبێ، خۆ لە هەموو جیهاندا وا نییە.. تۆ پێت نەوتم چۆن بە هەڵەدا ئەبرێم؟

زوبێر: بۆ نموونە زۆرترین ئامۆژگارییت بە خۆڕایی ئەداتێ لەسەر بەکارهێنانی جۆرێک میوەی تایبەت، یان نەخۆشییەک و چارەسەرەکەی، تۆ سوور بزانە ئەوە بە خۆڕایی ناکرێت.. بۆ نمونە مۆز وەرگرین، یان هەر میوەیەکیتر، ئەوەندە بە مەترسیی دائەنێ بۆ سەر نەخۆشییەک، کە ئیتر تۆ نەچی بەلایدا.

ڕێژوان: جا ئەوە بۆ منی بە هەڵەدا بردووە؟

زوبێر: لەبەرئەوەی تۆ نازانی کە ئەو قسانە ڕاست نیین و لە پشتی ئەوەوە بڕە پارەیەکی زۆر خەرج ئەکرێ بۆ خستنی بازاڕی ئەو جۆرە میوەیە.

ڕێژوان: دوای ئەوە بۆ ئەوە ئەکا؟

زوبێر: دڵنیابە لەوەی وڵاتێک هەیە سەرچاوەی سەرەکیی داهاتی ئەو میوەیەیە.. بەو بێ ڕەواجکردنی سەرچاوە سەرەکییەی، وڵاتەکە ناچار ئەکا، مل بدا بۆ داخوازییەکانی، بۆ ملکەچ پێکردن و زەلیل کردنی، دواتریش بە هەندێ ڕیکلامیتر بازاڕی بۆ پەیا ئەکاتەوە.

ڕێژوان: جا کێ سوود لەم بازاڕ خستنە ئەبینێ، وا ئەو هەموو پارەیەی تیا خەرج ئەکا؟

زوبێر: هەیهووو! ئەی من سەرەتا چیم پێوتی؟ کورە ماڵێکتا ئەزانی خۆم بینیم نوسرابوو مریشک نابێ کەوڵ بکرێ و نابێ بشۆرێتەوە، چونکە مرۆڤ توشی شێرپەنجە ئەکا هاهاها.. ئەوان ئەوەندە ئاستی خەڵکیان پێ نزمە، لەو باوەڕەدان بەوەش هەڵئەخەڵەتێن.

ڕێژوان: باوە گیان من تەنها بۆ پەیوەندیکردن و زانیاری بەسوود سەیری ئەکەم، پەیوەندیم بەو شتانەوە نییە.

زوبێر: ڕێک ئەویش ئەوەی ئەوێ، تا هیچ شتێک لەسەر وەک مرۆڤ ژیان نەخوێنیتەوەو نەیبیستی.. ئادەی بزانم چی لە بارەی پێش سەرهەڵدانی دامەزراوەی دەسەڵاتەوە ئەزانی، خۆ پێش ئەوەش مرۆڤ هەر ژیاوەو چاو بەرەوژێری کەسیش نەبووە.

ڕێژوان: باوکە تۆ پڕی و منیش تاقەتی ئەو سەرێشەیەم نییە، چونکە تێی ناگەم.. تۆ پێم بڵێ ئەوەی ئەیهێنین لێی ئەخۆی؟ یان دابەشی ئەکەیت و زەوت ئەکرێ؟

Cut

دیمەنی – ٥٣٩ – ڕ – دەمەو ئێوارە/ د – گوند:

(( مریەم و دیدەوان))

دیدەوان: خۆم بە ڕەمزیم وت، پێت بڵێ لێرەم کە تۆی بینی.. ئەی تۆ لە کوێ ئەژیت؟

مریەم: ببورە ئەوە متمانەی تۆ بوو بە من، کە من بە هیچ کەسێکم نییە.. ناتوانم پێت بڵێم، گەر جاروبار هاتمەوەو ئیشێک هەبوو خێری هەمووماني تیابێ ئەیکەم و نەشبێ، شوێنیترم زۆرە تیا بحەوێمەوەو ئیشیشی تیابێ.

دیدەوان: تەنها تۆو ڕەمزی ئەزانن لێرەم، نامەوێ کەس بیزانێ.

مریەم: تۆ من ئەناسی دیدەوان، نە نهێنیی خۆم بە کەس ئەڵێم و نە نهێنیی خەڵکیش بەلامەوە گرنگە بیدرکێنم، ئەوە من نییم.

دیدەوان: سوپاس مریەم گیان، ئەوە باشە، خۆشحاڵت کردم بە هاتنت..چاو و دڵم ڕوون بووەوە.

مریەم: دیدەوان، ڕەمزی پێی وتم ئەگەر ئیشێک هەبێ، هەر لە ڕێگەی دیدەوانەوە ئەکرێ، من تەنها بۆ پرسیاری ئیش هاتووم، ئەگینا ئیشیترم بە تۆ نییە.

دیدەوان: ناو شار زۆر وێرانەو دەسەڵاتەکەی دارەوان بەدەست هەندێ هەرزەو کوڕوکاڵەوەیە.. گوێ لە کەس ناگرن.. منیش نامەوێ بگەڕێمەوە سەر ئیش و خۆم گورگان خواردوو بکەم.

مریەم: کەواتە بە یەکجاریی واز لە ئیشەکە ئەهێنی؟

((مام تەیفور دەرئەکەوێ))

دیدەوان: ئەوەیان نازانم، بەڵام لەم کاتەیا بەهیچ جۆرێک توخنی ئیشێک ناکەوم، کە خۆم بناغەیم دانابێ و بەلارێدا برابێ.

تەیفور(( بەخێرهاتنی خێری مریەم و وەڵام)): مامۆستا دیدەوان گایەلەکە گەڕایەوە.

دیدەوان: دەی تۆ ئەبینی میوانم هەیە مام تەیفور، خۆت بچۆ بەلایانەوەو کوڕەکەش بەرە، دوایی دێم.

تەیفور: بەسەرچاو. (( ئەڕوا ))

مریەم(( پێکەنین )): کەواتە حەیوانداری؟

دیدەوان: پێکەنینی نەئەویست مریەم.. گرنگ ژیانە.. جا منیش بەردەوام ئەمەوێ باشتر بژیم، لە هەر شوێنێکیش بێ، هەر وام کردووە.

مریەم: ئۆو ببورە دیدەوان، مەبەستم نەبوو.

Cut

دیمەنی – ٥٤١ – ش/ د – سەرجادەیەکی گەڕەک:

(( تایەرو برزو و هاوکارو ئاکارو شەماڵ و شاخە))

شاخە: بڕوا بکەن لەو چارەسەرە زیاتر نییە، چونکی ئەبێ زۆر بە وریاییەوە شوێنیان بکەون.. ئەو دەرفەتەی دوێنێ شەوێ هەبوو، بەڵام ئەو لە ئێمە وریاتر بوو.

تایەر: لەچاوتروکانێکا خۆی ون کرد.

شاخە: با لەسەر ئەوە نەڕۆین.. ئەمجارە هەر گەورەم وتی بۆ ئەوێ ئەچم، لە هەر کونێکەوە بێ من تەلەفونت بۆ ئەکەم.. لە ئەوەڵەوە دوای خۆی بکەون، ئیتر تا ئەو شوێنەی ئەوان ئەبینێ، لەوێوە ئەبێ خۆتان ماتدەن، تا دەرئەچن.. زۆر نزیک نابنەوە لێیان، تا بزانن بە چ لایەکا ئەڕۆن..

برزو: ئەی چۆن ئاشکرا نابین؟ کێ ناڵێ شوێنیان پێچ و پەنا نییە، ئەوسا ڕێک ئەزانن بە دوایانەوەین.

شەماڵ: ئافەرین برزو ئەوە یەک قسەی تەواو بکەی، ڕاست ئەکا.

شاخە: با قسەکەم تەواوکەم.. ئەوجارە تا ئەبینن بە چ لایەکا ئەچن.. جاری داهاتوو، ئەبێ کە دەرچوون، یەکێکێک لەو شوێنەوە دوایان بکەوێ، کە جاری پێشوو بەجێتان هێشتووە.. ئیتر بەوجۆرە تا ئەگەنە ماڵی پاشا.

تایەر: یەعنی شیردا بۆ داپیردا. (( ماتۆڕسوارێک تێئەپەڕێ)) ئەوەت نەناسی؟

شاخە: نا قەت نەمبینیوە.

ئاکار: هەر ئەو چارەسەرە هەیە، دەسەڵات نییە.

برزو: کاکە من ڕایەکیترم هەیە، ئەڵێم با هەموومان بە ماتۆڕەوە دوای کەوین، خۆ هەمووومانی بۆ ناکوژرێ؟

شەماڵ(( دەست ئەخاتەوە سەر دەمی)): یەک قسەت تەواو بوو، ئیتر بێدەنگ بە، بێدەنگ.. کەسمان نازانین ماتۆڕ لێخوڕین.. تەواو ئیتر قسەیتر نەکەی.

هاوكار(( بۆ شاخە)): من لەو ناوە زۆر چاو ئەگێرم، كەسێک نابینم چاودێریی دوكانەكەشتان بكا، ئەگەر یەكێكی وا هەبێ، لەوانەیە بمانگەیەنێتە شتێک.

شەماڵ: دەتوخوا ئەگەر تۆش بێدەنگ نەبی، فیكرەكانت لە فیكرەی برزو ئەچێ.. ئەوە بۆ چی باشە ها؟

هاوكار: ئەڵێم لەوانەیە باش بێ.

شەماڵ: نەخێر لەمانەش نییەو هیچ باشیش نییە.

(( لە میوتیدا حوارو ڕۆشتنی شاخەو خواحافیزیی)) __________ Cut __________

دیمەنی – ٥٤٢ – ش/د – قاوەخانەیەک:

(( شەنیاو دڵنیاو دەوران))

دڵنیا: ئەرێ نەچین بۆ شوێنێک؟ هەر سڕ بووم لێرە.

دەوران: بۆ کوێ بچین؟ ئەچیتە هەر شوێنێک هەر وەکو ئێرە وایە.

دڵنیا: ئەها.. بیری تۆم نەبوو کە لە شوێنێ گیرسایتەوە، ئیتر هەڵناکەنرێی!

دەوران: هیچ وانییە، ئەگەر شتێکی پێویست هەبێ، پێش ئێوە ئەیگەمێ.. نا مەکە تۆ کارگەکەم بۆ بەڕێوە ئەبەی، وا نییە؟

شەنیا: باشە تۆ کوێ پێشنیاز ئەکەی دڵنیا؟

دڵنیا: هەر شوێنێک بێ کێشەم نییە.. ئەوەندە لێرە دانیشتووین هەموویان وەک کەسوکاری خۆیان سەیرمان ئەکەن.

دەوران: جا باشتر.

شەنیا: ئەوە کێشە نییە چۆن سەیرمان ئەکەن، هێمنەو خراپ نییە، بەڵام من برسیمە.

دەوران: چاوت دەرئەهات هەهە شتێ بانگکە.

شەنیا: مادام چاوم دەرئەهات، من حەزم لە خواردنی ئێرە نییە ئەمشەو.

دڵنیا: ئەی خۆ داوای سەروپێشمان لێ ناکەی؟

شەنیا: بۆ نا؟ وەڵا خۆ سەروپێش خۆشە.

دەوران: بۆ هەر شوێنێک ئەچن، من ئەتانگەیەنم و ئەچمەوە بۆ لای نیگاری دایکم.

شەنیا: دە بزانە چیتان هەیە.. ئەچینەوە بۆ لای ئەو.

دەوران: باشترینە.. (( بە مۆبایلەکەی کە هەر خەریکی بوو، دایکی وەرئەگرێ))

Cut

دیمەنی – ٥٤٣ – ش/ن – ماڵی ئەردەڵان:

(( ژوورێکی گڵ، لە دەستێ نوێن و هەندێ قاپ و قاچاخ زیاتر نییە، هەندێ جلی شڕەش بە بزمارا هەڵواسراوە.. ئەردەڵان ڕاکشاوە، هاوڕێ بەدیاریەوە))

هاوڕێ: دە هەستە بتبەم بۆ خەستەخانە.

ئەردەڵان: بەخوا ناتوانم، ئەی ئێوارە نەتبردم بۆ لای موزەمیدەکە، دەرزی لێدام، ئێستاکیەنە کەمێک باشترم هاوڕێ گیان، تۆ بچۆرەوە بۆ ماڵەوە مناڵ چاوەڕێتن.

هاوڕێ: ئەی چۆن ئەکرێ بەم حاڵەوە جێت بهێڵم و کەسیش نەبێ ئاگادارت بێ؟

ئەردەڵان: قەینا برا، زوو زوو پەتا ئەگرم، بەیانیی وەک گوێزی ساغم لێ دێت خەمت نەبێ.

هاوڕێ: کورە تەلەفونێ بۆ ماڵ و مناڵ ئەکەم و ئەڵێم ئەمشەو لای ئەو برادەرەم ئەبم نەساغە.

ئەردەڵان: کورە نا نا نەکەی.. بڕۆوە کاکە تۆ بڕۆ، هیچ خەمی منت نەبێ، بەیانی ئەتبینمەوە.

هاوڕێ: ئای خوا بەدەست ئەردەڵانەوە! دەی کەواتە با درەنگتر نەکەوم من بڕۆم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی هاوڕێ، ئەردەڵان ئەخەوێ))

Cut

دیمەنی – ٥٤٤ – ڕ / د – بەردەرگای مدخلی ماڵی هەڵشۆ:

(( هەڵشۆ لە بەر دەرگا وەستاوەو تێل ئەکا ))

هەڵشۆ: ئای خوایە خۆ گەمژەیە مۆبایلیشی داخستووە. (( بە کلیل زۆر هەوڵ ئەدا بۆی ناکرێتەوە)) شوکور تۆقیوە بە شیش دایخستووە.. (( بە توندی لە دەرگا ئەدا چەند جارێک)) هەی طرحێو چاک وریا نییە، وەڵا دەرگاکەش بشکێنم خەبەری نابێتەوە.

تریفە(( دەنگی لەودیوی دەرگاکەوە)): کێیە ئەوە؟

هەڵشۆ: بیکەرەوە خۆمم.

تریفە(( لەگەڵ کردنەوە، نیوەی حواری بە دەنگ لە ژوورەوەو ئەویتر لە دەرەوە)): جا ئێستاش بۆ هاتییەوە، وا سەعات شەشە.. هەر لەو شوێنە بخەوتیایە کە لێی بووی. (( کە دێتە دەرەوە بێ ماکیاژو سەروقژ ئاڵۆسکاو، تازە خەبەری بووەتەوە))

هەڵشۆ: دەمدرێژیی مەکە، هەر ئەوەیە..(( ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٥٤٥ – ڕ/ ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( ئاوا بە شەرمەوە دێتە ژوورەوە، جددیە، گێلاس و نینا دانیشتوون، پاش سڵاو))

نینا: ها، شێت، درەنگ هاتی!

گێلاس(( تحذیر)): نینا!!

نینا: بەینی خۆمانە قەینا!

ئاوا: خەتای منە گێلاس خان؟

گێلاس ((سوعبەت)): نەوەڵا خەتای تۆ نییە، چییە پێی ناوێری؟

ئاوا: پێویرانی چی گێلاس خان؟ بەخوا لەگەڵ دەم ئەکاتەوە حەز ئەکەم سەرم بخەمە ناو قژییەوەو خۆم بشارمەوە.

نینا: زەرەریشت نییە، وا نا؟

گێلاس(( پێکەنین)): دەبخۆ دەی وا ئەزانی هەموو کەسێ دیاری داماوە خستووتەتە کونەوە، ئەی وەڵامی واش هەیە.

نینا: دەی جەنابی ئەفسەر تا پۆلیسەکە نەهاتۆتەوە تێڵاطرێنتکا، با بچینە سەرەوە چێشتخانەو میوانەکان ببینی.

ئاوا: بە مەرجی ئەوەی دەعوەتی تۆبم.

گێلاس: نا دەعوەتی منی کاک ئاوا.

ئاوا: قبوڵم نییە، ئەبێ ئەم بە بەرچاوی خۆمەوە پارەی خواردنەکەم بدا.

نینا: ئەم کابرایە زۆربڵێیە پورێ، تا لەگەڵی بڵێی زیاتر ئەڵێ، بەس خۆم باشی ئەناسم.. باشە وەرە دەعوەتی منی. (( ئاوا دەست بە بۆینباخەکەیا ئەهێنێ و ئحم ئحم ئەکا))

نینا: هەی چوارپەلت لە مەنجەڵی چێشتا بە کوڵانچێ باشە؟.. پێشمکەوە

ئاوا: ئەها پورە گێلاس ئەوەندەی خۆش ئەوێم، بە بینینم ڕازی نابێ، ئەشیەوێ بمخوا

(( پێکەنینی گێلاس و ئاوا ))

نینا: کورە هەی شیت تۆ لە شڵەژاوییا گێلاس خانت لێ بوو بە پورە گێلاس.

(( پێکەنینی گێلاس و نینا ))

ئاوا: کچێ تۆ چۆن دنیا ببینی منیش ئاوا ئەیبینم، ئەی چۆن؟ هەناسە گیان.

نینا: پورە گێلاس ئێستا بڕوات کرد کە ئەڵێم شێتە؟

ئاوا: بەخوا ئەم قسەیەت زۆر تەواو بوو، بۆ تۆ ئەقڵت لە مێشکی منا هێشتووە تا ئاقڵ بم؟

گێلاس(( بە پێکەنینەوە)): وا بڕوا بە ئیشەکەتانا ڕاناگەن، (( خۆ تورە کردنی سوعبەت)) بچن بەلای ئیشەکەتانەوە دەی!

(( لەسەر تۆ پێشکەوەو تۆ پێشکەوەوش حواری ئاسایی))

ئاوا: من بە هەموو ژیانم پێش تۆ ناکەوم.

نینا: ئافەرین ئاوا ئاقڵبە. (( خەریکە بڕوا ))

ئاوا: ئاخر نەک ئەودیوی ئەو شوێنە مەترسی بێ و تیابچم.

گێلاس(( بەسوعبەت)): کورە با هەڵنەسم بۆتان، (( دەنگی بەرز)) ئیشەکەتان!!!!!

(( نینا بە خێرایی پێش ئەکەوێ و ئاواش نمایشی ڕاکردن بەدوایدا ))

Cut

دیمەنی – ٥٤٦ – ڕ – عەسر/ د – باخی گەڕەک:

(( حەمە تایەرو شەماڵ و ئاکارو برزو))

ئاکار: تۆ سەرەتا دوایکەوە حەمە تایەر، ماوەیەک ئەڕۆیت و من وەستاوم، کە منت بینی تەسلیمی منیکە.. سەیارە کە هەستیکرد دوایکەوتوون، پێوەی دیارە، هەرکاتێ ئەوەم هەست پێکرد، منیش ئەچم بە لایەکیترداو ئەو شوێنە دیاری ئەکەین.. ئەوە بۆ ئەمجارە بەسە.. جاری دووەم لەو شوێنەوە دەست پێ ئەکەین.

برزو: ئەی ئەگەر جاریتر لە شوێنێکی ترەوە ڕۆشتن.

شەماڵ (( ئەکێشی بە شەنیا)): بە شەرەفم ئەمە دووجار قسەی تەواو بکەی هەتیو، ڕێک ئەتوت لە دڵی منایە.

تایەر: قسەکەیان تەواوە.

ئاکار: لە کۆتاییدا ئەیدۆزینەوە چەند ڕێگەیان هەیە، ئەوساش پلانەکە ئەگۆڕین.

برزو: ئەی ئیشی ئێمە چییە؟

ئاکار: تۆو شەماڵ پیادەیی، تەنها چاودێریی ئەو ماڵە بکەن کە شاموراد بۆی ئەچێ، بەڵام چۆڵی مەکەن تا ئێمە ئەگەڕێینەوەو هەڵتان ئەگرین.

تایەر: ئەی ئەگەر هات و لە ماڵەوە شامورادیان برد؟

ئاکار: وەک شاخە وتی هەموو جارێک شاموراد ئەچێتە ماڵەکەو لەوێوە براوە.. عاسمانەکە چۆن بیرت لەوە کردەوە.

شەماڵ: بەوە ئەمجارەمان فت ئەبێ.

ئاکار: توخوا ئیتر بیر مەکەنەوە، با سەرمان لێ نەشێوێ.. ئێمە لەسەر ئەوە ئیش ئەکەین کە تا ئێستا ڕوویداوە.. زیاتر نا.

Cut

دیمەنی – ٥٤٧ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس دانیشتووەو ئاواو نینا بە پێوە))

گێلاس: یەعنی پارەکەشی بە تۆدا؟ ئەی نەموت پارە نەدەی یەکەمجارتەو بۆ ئیشی ئێمەش هاتووی.

نینا: نا نا.. با فێر نەبێ.. هەموو جارێ کە هاتی ئاوا پارەکەت بدە باش؟

ئاوا: تا تۆ لێرە بی ئیتر نایەمەوە بەمناوەیا هەی فێڵباز.

نینا: ئاوات لێ ئەکەم، دەبخۆ دەردت بێ.

ئاوا: تا زووە بڕۆم، ئێستا دەردم دەرخوارد ئەدا، یەک تۆزیتر بمێنمەوە دەرمانخواردیشم ئەکا.

نینا: جا کێ ئەڵێ بۆم نەکردوویتە خواردنەکەوە، بڕۆیت و نەڕۆی فەرقی نییە هههە.

گێلاس(( کەمێک جددی تورە)): نینا چیم پێوتی؟

نینا: قەینا قبوڵیەتی، توخوا وا نییە ئاوا؟

ئاوا: الحکم للە، دەسەڵاتم چییە؟ ئیتر من ئەڕۆم، ئەمرێکتان نییە؟ ئەوە دوایی حسابی وردی بۆ ئەکەم.

گێلاس: یاخوا ماڵت ئاوا بێ.

(( نینا تا ناو دەرگاکە لە پشتەوە بەڕێی ئەکات و گێلاس لەگەڵیا ئەچێتە دەرەوە بۆ بەڕێکردن.. خواحافیزیی ))

______ تابع ______ Cut ______

دیمەنی – ٥٤٨ – متبوع – ڕ/د – بەردەمی ئۆفیسی گێلاس:

(( نیناو گێلاس ئاوا بەڕێ ئەکەن))

(( خواحافیزیی و نینا ئەچێتە ژوورەوە.. گێلاس دێتەوە بۆ لای ئاواو بانگی ئەکا))

گێلاس: ئاوا گیان ببورە کوڕم ڕامگرتی.. خۆت ئەزانی من گومانم لە دڵسۆزیی براکەم نییە، بەڵام بەخوا پارەی ڕیکلام هەڵی تەکاندووم، تۆ بزانە لە شوێنێکیتر بە هەرزانتر دەستت ناکەوێ.

ئاوا: بەسەرچاو گێلاس خان، من نرخی سپۆتیەکەو بڵاوکردنەوەی لە تەلەفزیۆنەکان لە سێ چوار کۆمپانیاو و ڕیکلامی شارەوانی و شاشە گەورەکان و سایت و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانت هەموو بۆ وەرئەگرم، ئیتر ئەوسا خۆت پێی بڵێ لەو شوێنە بیکات.یزیی

گێلاس: بەڵام بەڵێنم پێ بدە نینا نەزانێت، ڕەنگە بکەوێتەوە دەم باوکی و ئەوسا عاجز بێ وا بزانێ گۆمانم لێی هەیە.

ئاوا: هیچ خەمت نەبێ پورە گێلاس (( بزە)) بەڵێن بێ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی ئاواو گەڕانەوەی گێلاس بۆ ئۆفیسەکەی))

Cut

دیمەنی – ٥٤٩ – ڕ/ ن - نەخۆشخانە:

(( بێستان خەوتووە، تریفە بە چەپکێ گوڵەوەو کۆژین زۆر بێتاقەت بە دیاریەوە))

تریفە: نا توخوا جارێ پێی مەڵێ، کێ ئەڵێ وایە، با ئەو خەفەتەشی بۆ دروست نەبێ.. بۆ کۆرپەلەکە زانیویەتی؟

کۆژین: بەڵێ، هەر چاوی هەڵهێنا خۆی زانی.. ئەویتریش دکتۆر ئەڵێ ئەگەری ئەوەی هەیە توشی نەزۆکیی بکا.. مەرجیش نییە، بەڵام ئیتر بۆ ئەوەی دواتر شۆکمان نەکا پێی وتین.

تریفە: نا ئیشەڵڵا قەت ئەوە نابێ.. بەخوا بێستان زۆر باشە، شایانی هەموو باشەیەکە.

(( بێستان چاو ئەکاتەوەو تریفە ئەکشی بۆلای ڕوخساری و یەکتر ماچ ئەکەن و هەواڵپرسین))

بێستان: کچێ تۆ مردی پێمانەوە تریفە گیان.

تریفە: ئای ئای توخوا حەیفت نەکرد وا ئەڵێی بێستان گیان، ئەوە چییە ئەو قسانە؟

کۆژین: لێیگەڕێ بێستان وا مورتاحە، منیش زۆرم لەگەڵ وت.

بێستان: کۆژین گێژم گێژ!

کۆژین: بە دکتۆرم وت، وتی هیچ نییە هی داوو دەرمانەکانیەتی.

بێستان: ئەی کەی دەرئەچم؟

کۆژین: بە قسەی دکتۆرەکە، سبەی یا دوو سبەی.

(( لە میوتیدا خەندەو دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥٥٠ – ڕ/ عەسرێکی درەنگ/ د – نزیکی خانوویەکی دووقات:

(( ئاکارو شەماڵ و برزو و حەمە تایەر))

ئاکار: بە ناونیشانەکەی شاخەبێ، ئەوە ماڵەکەیە، برزو، شەماڵ.. وا خۆتان نیشان نادەن کە چاودێریی ئەو شوێنە ئەکەن.. بە تیلەچاو زیاتر سەیر ناکەن، ئەویش هەموو دەقەیەک نا، لەگەڵ هەستکردن بە جووڵەدا، نزیکی سەری فەرعەکە ببنەوە..

شەماڵ:باشە من وا ئەکەم، بەڵام یاخوا پلانەکەت سەرنەگرێ، هەهە لەو بڕوایەدای لە دەمی من ڕزگار بی؟

ئاکار: ئێوە جارێ بە قسەم بکەن، دواتر چی ئەکەن بیکەن.

تایەر: وەختی سوعبەت نییە. ئێ؟

ئاکار: حەمە تایەر تۆ لەو دیوی فەرعەکە بوەستەو چاوەڕوانی ئەمان بە پێت بڵێن بجولێیت.. سەیارەکەت لەو ماڵەوە دیار نەبێ، لەگەڵ ئەوان دەرچوون، ئەمان پێت بڵێن ئەوە جولا.. سەیارەکەیان ڕووی لێرەیە.. ئەگەر لە حاڵەتێکدا هەر لە کۆڵانەکەشدا پێچیان کردەوە، ئەمان ئاگادارت ئەکەنەوەو بە پەلە ئەگەیتە سەر جادەکە لەو دیوەوە..

تایەر: زۆر باشە.

ئاکار: بە هیچ جۆرێک شەماڵ و برزو، مۆبایل بەکار ناهێنن، هەر ئێستا دایخەن، نەک کەسێک پەیوەندیتان پێوە بکا.. با وەک چاودێریی دەرنەکەون.

تایەر: ئەی من و تۆ؟

ئاکار: لەگەڵ دوایان کەوتی تەلەفونم بۆ بکەو دایمەخەرەوە، بەرەو هەر کوێ چوون پێم بڵێ، من پێشتر دەرئەچم.

تایەر: زۆر باشە.

ئاكار: دەی هەر كەس شوێنی خۆی بزانێ.. ئیشەڵڵا ئەمشەو شتی باشمان دەست ئەكەوێ.

(( بڵاو بوونەوەیان بە پێی قسەكانی ئاكار))

Cut

دیمەنی – ٥٥١ – ڕ- ئێوارە/د – حەوشەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و خدر دێنە ژوورەوە، تیرۆژ باخەکە ئاو ئەدا.. دوای سڵاو.. تیرۆژ بە گەرمی بەخێرهاتنی خدر ئەکا))

نارەوەن: چیت لێناوە؟ میوانمان هەیە.

خدر: نا نا.. توخوا ئەرک مەخە سەری ئەو ئیمتحاناتی هەیە.

تیرۆژ: نا، تەواو بووین.. خواردنی  باشیشم دروست کردووە، خەسووت خۆشی ئەوێی!

خدر: یەعنی تا ئێستا کەس خۆشی ناوێم چونکە خەسووم نییە.

نارەوەن: مەبەستی ئەوەیە بەسەر خواردنی باشا هاتووی.

خدر: ئەزانم نارەخان، سوعبەتی لەگەڵ ئەکەم.

تیرۆژ: لێرە دائەنیشن یا لە ژوورەوە؟

نارەوەن (( خەندە)): وا جەنابت باخەکەت کردووە بە قوڕ، ئەچینە ژوورەوە.

تیرۆژ (( ئیشارەتی کۆنکرێتەکە ئەکا)): جا لێرە دانیشن فێنکترو خۆشترە.

خدر: دەی با قسەی ئەو بێ.

(( تیرۆژ سێ کورسی دەرئەکا لە کورسییە هەڵچنراوەکان و ئەم مۆنۆلۆژی ناوەوەە ناوەکییەش ئەڵێ))

<u>تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

ئەرێ خۆ بیرم لەم نەکردبۆوە.. وەڵا خراپ نییەو هەشیەتی.. بۆ نا؟ لە خۆم گەورەترە با هەر گەورەتر بێ.

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>:

تیرۆژ(( بە نیانیی تەماشای خدر ئەکا)): فەرموون دانیشن!

خدر(( چاو دائەخا )): ئای سوپاس تیرۆژ گیان.. جا وەختی خۆی ژنم نەهێنا تا کچەکەم ئێستا هاوڕێت بووایە.

**<u>تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>**: وەی قوزەڵقورت! **<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>**:

تیرۆژ: نا نا کاک حەمە خدر یەکجار وا منداڵیش نییم، ئەوە زانکۆم تەواوکرد ئیتر منداڵی چی؟

نارەوەن: ئا یەکجار وا منداڵ نیت، بەس ڕەنگە کە تۆ لەدایکبوویت، ئەو ناوەندیشی تەواو کردبێ؟

(( پێکەنین و دیالۆگ لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ٥٥٢ – ش/ د / بەردەمی خانووی ئاسۆو خەلیل:

(( سەیارەکەی شاموراد دێت و دائەبەزێ.. لە دەرگا ئەدات و کەس نایکاتەوە.. شەماڵ و برزو یەکیان ئەچێتە سەرسووچەکەو بە تایەر ئەڵێت.. ماوەیەک شاموراد ئەوەستێ.. دواتر تەلەفونێکی بۆ دێت، ئەچێتەوە سواری سەیارەکەی ئەبێتەوەو ئەڕوا.. شەماڵ و برزو ئەچنە لای تایەر))

شەماڵ: لەوە ئەچێ نەیبەن، گەڕایەوە.

برزو: منیش ئەڵێم ڕەنگە هەستیان بە ئێمە کردبێ و لە شوێنێکیتر هەڵیگرن.

شەماڵ: هەی کەر ئەوەتا سەیارەکەی خۆیان لەوێ وەستاوە، ئیتر بە چی ئەیبەن؟

برزو: کورە تۆ زۆر بێ ئەقڵی، خۆ سەیارە قات نەبووە؟

تایەر: دە با بە ئاکار بڵێم.

شەماڵ: جا تا بە ئاکار ئەڵێی، شاموراد ئەسەریشی نامێنێ.

تایەر: دە سەرکەون با بزانین ئەیدۆزینەوە؟

(( سەرئەکەون و بە خێرایی بەو کۆڵانەدا ئەڕۆن و پاش کەمێک شاموراد ئەگەڕێتەوە هەمان شوێن و خەلیل و ئاسۆ ئەیخەنە سەیارەی خۆیانەوەو ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٥٥٣ – ش/ د – سەرشەقامێک:

((تایەرو شەماڵ و برزو لە سەیارەکەدان و بۆ سەیارەی شاموراد ئەگەڕێن))

شەماڵ: بابە تۆش نابێ بێیتە سەر قسەی برزو، دڵنیابە بینینەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە.. خۆم ئاگام لێ بوو تەلەفونیان بۆ کردو دوای تەلەفونەکە ڕۆشت.

تایەر: بڵێم چی؟ خۆ هیچمان لە کیس ناچێ، وا بزانە پیاسەیە.

برزو: دەمخۆش تایەر، ئیتر من وا تێگەیشتم.

شەماڵ: جا تۆ کەی خراپ تێنەگەیشتووی؟ خۆ ئیشی یەکەمجارت نییە.

Cut

دیمەنی – ٥٥٤ – ش/ن – ژووری پاشا:

(( چاوی شاموراد ئەكرێتەوەو پاشاش بە دەمامک یان تورەكەی سەریەوە، كە چاو و دەمی دیارە دانیشتووە))

پاشا: چۆنی شاموراد؟

شاموراد(( ترس)): دەستت ماچ ئەكەم پاشا گیان، ئەگەر جەنابت باش و سەلامەت بیت.

پاشا: دەستی تۆو ئەو كوڕانەش خۆش بێ شاموراد، لەم دواییەدا هەموو ئیشەكانتان بە باشیی بەڕێوە برد.. پارەو ئاڵتوونەكانت هێناوە؟

شاموراد: دەستت ماچ ئەكەم پاشا گیان، بەڵێ، بە پێی ڕێنوێنیی جەنابتە.

پاشا: لێرە دەست و دیاریی خۆتان وەرگرن و كە گەڕایتەوە دیارییەكی گەورەشم لە دوكانەكەت بۆ داناوی، ئەوەیانت تا مردنت بیر ناچێتەوە (( بە ئاماژە)) ئەو دیارییەیان هەر زۆر گەورەو بەنرخە.. باوەڕم پێ بكە سێ چوار ڕۆژ هەر بەدیاریەوە ڕائەمێنی و نازانی چەند دڵخۆش ئەبی.. گرنگ ئەوەیە بەشی هەموو ژیانت ئەكا.

شاموراد: دەستت ماچ ئەكەم پاشا گیان، هەڵبەت هەر دیارییەک لە جەنابتەوە بێ دڵخۆشكەرو گەورەیەو بە ژیانم منەتبارتم.

پاشا: ئا ئا.. هەر كە ڕۆشتیتەوە یەكسەر بچۆ بۆ دوكانەكەت و ئەویش بۆ خۆت ببەرەوە بۆ ماڵەوە.. نەئەگونجا بیهێنین بۆ ئێرە.. ئەگینا لێرە ئەمخستە بەرچاوت.. زۆر گەورەیە، من خۆم بە گەورەی ئەزانم.

شاموراد (( ترس و خەندە)): جا پاشا گیان شتێ جەنابت بە گەورەی بزانی، هەر زۆر مەزنە.

پاشا: ئۆو هەر زۆر دڵخۆشت ئەكا، بۆیە لێرە پێت ناڵێم، پێم باشە بە كەف و كوڵ و شەوقەوە بۆ ئەو سوپرایزە بچیت.. ئاخر ئەم ماوەیە هەر زۆر زۆرتان بۆ پەیا كردم (( قاقاو پێكەنینی زۆر)) ئەوە بەشی هەموو ژیانی منیش ئەكا.

شاموراد: پاشا گیان خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ و بۆ ئێمە بمێنیت.

پاشا: لەم هەموو دڵخۆشییەشدا شاموراد کە هەردووکمان پێویستیمان بە هیچ شتێک نەماوە، وەک هەموو جارێکیتر ئاگادارت ئەکەمەوە، لێرە هەموو شتێکی باش و خراپ قبوڵە، تەنها خیانەت و ناپاکیی نەبێ.. ئەمە بەو کوڕانەی لای خۆت و ئەوانەی داهاتووش بڵێ کە متمانەیان پێ ئەکەیت و لەگەڵتا ئیش ئەکەن.

شاموراد(( ترسی زیاتر)): بە دڵنیایی و بە بەردەوامییش پێموتوون پاشا گیان، ئیشەڵڵا قەت شتی وا لە ئێمە ناوەشێتەوە.

پاشا: ئا بۆ نمونە، کە ئێمە تەقەمان لە ژنی ئەو ڕائیدەکە کردووە، نابێ تۆو ئەوان لەگەڵ ڕائیدەکە دەست تێکەڵکەن.

شاموراد(( تۆزێک قیت ئەبێتەوە)): هەر زۆر ڕاستە پاشا گیان، شتی وا ڕووبدا بە دەستی خۆم ئەیانکوژم.

پاشا: ئافەرین شاموراد.. یان ئەو هەتیوەی خۆمان کوشتمان، براکانی هێڵی سوورن (( زۆر بە پەلە دێڕی دوای ئەمە ئەڵێ، بۆ ئەوەی شاموراد وەڵام نەداتەوە)) ئا یان ئەوانەی دزیان لێ ئەکرێ، یان ئەچینە سەریان بۆ سەرانە.. من بۆیە هەموو جارێک ئەمانە ئەڵێمەوە تا هیچی هەڵە ڕوو نەدا.. کە لە تەلەفونا پێت ئەڵێم هەڵەم ناوێ، مەبەستم ئەو شتانەیە، یان ناحەزێک هەوڵ بدا دوای شوێن پێت بکەوێ.. ئەمانە هەر بیرخستنەوەن.. ئەگینا من لە خۆت و کوڕەکانی لای تۆ زۆر دڵنیام، کارەکانیشیان سەنگی مەحەکن.

شاموراد: پاشا گیان هەرچی ئەفەرموویت سەر سەرو سەرچاوم، وەک خۆی جێبەجێ ئەکرێ.

پاشا: دە چاوی ببەستنەوەو بیبەنەوە ئەودیو، با هەقی خۆیان وەرگرن، ئا شاموراد، دیارییەکەی دوکانیشت بیر نەچێ، ئەویش ببە، براکەم.

چاوبەستنەوەو ڕۆشتن و خواحافیزیی))______________ Cut ______________

دیمەنی – ٥٥٥ – ش/ن – ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس سست و ئاکۆ دانیشتوون))

ئاکۆ: ئەو ماوەیەی لە دوکان نەبووم، خێر باری بوو، ئەو کوڕەی ئەوێ زۆر لە سەروو چاوەڕوانیی منەوە دەستپاک و ئەمین دەرچوو.

گێلاس: فارس هەر وا بووە، زۆر دەستپاکە.

ئاکۆ: پارەیەکی زۆر زۆری بۆ دانابووم، قازانجێکی سەیری کردبوو، هەر زۆر.

گێلاس: ئەوچاتر، لە خوا بەزیاد بێ.

ئاکۆ: ئەشزانم تۆ ئەو پارەیەی بۆ ئوتێلەکەت دانابوو، کورتی هێناوەو لێت بڕاوە.. ئەتەوێ لەوی تەلارەکە پارە دەربێنی.

گێلاس: ئەی هەر ئەبێ وا بکەم؟

ئاکۆ: بۆیە بڕیارمدا، منیش هاوکارییەکی باشت بکەم، بڕێکی باشم بۆ داناوی.. بەڵام بە مەرجێک.

گێلاس: وەی بەساقەوبم زۆر زۆر سوپاس.. ئەشهەدوبیللا فریام کەوتی.. مەرجی چی؟

ئاکۆ: ئیتر ڕیکلام بەسە.. ئەزانی هیچ هەڵبژاردنێک ئەوەندە پارەی تێنەچووە بۆ ڕیکلام کردن؟! هههە.

گێلاس: من سبەینێ وەڵامی ئەوەت ئەدەمەوە.. با شتێک هەیە لێی دڵنیابم، ئەوکاتە قسە ئەکەم.. بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا مەرجەکەت قبوڵەو ئیتر توانای ڕیکلام کردنم نەماوە، بەو حسابە بووایە، ئەبووایە من شەوانە یەک جێی چۆڵم نەبووایە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥٥٦ – ش/ د – لای خانووی ئاسۆو خەلیلەوە:

Mute

(( سەیارەی شاموراد لەو دەوروبەرە وەستاوە.. سەیارەی ئاسۆو خەلیل دێت و لە نزیک سەیارەکەی شاموراد ئەوەستێت، شاموراد دائەبەزێت و ئەچێتە سەیارەی خۆیەوە))

—— تابع —— Cut ——

دیمەنی – ٥٥٧ – متبوع – ش/د – جادەی دوکانی لەنگە:

(( لە دوورەوە سەیارەکەی شاموراد دێت و لەبەردەم دوکاندا ئەوەستێ، شاموراد دائەبەزێت و لە درزەکانەوە ئەبینێ گلۆپی دوکان هەڵکراوە، پێی سەیر ئەبێ و دوکان ئەکاتەوە.. حەپەسان و ترس و تۆقینی زۆر))

شاموراد((بە دەنگی تۆقیوی بەرز)): ئای خوا هاوارررر!!!

# (( ئەڵقەی بیست و حەوت))

(( شاخە لە ناو دوکانا بە پەتێک خنکێنراوەو هەر بە شیشی سەقفەکەوەیەو ملی لار بووەتەوە.. مۆبایل دەرئەهێنێت و تەلەفون ئەکا.. پاش کەمێک دەنگی سەیارەی پۆلیس دێت و ئەوەستن و دائەبەزن))

Cut

دیمەنی – ٥٥٨ – ڕ/ د- بەردەمیماڵی ڕێژوان:

(( سەلوا ئەگری لە ناو دەرگاکەدایەو ڕێژوان چاو بەگریان))

سەلوا: ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟

ڕێژوان: نازانم سەرم لێ شێواوە، تەلەفونم بۆ بروسک کرد، ئەچم بەدوای چیمەنا ئەیهێنم با لە پڕا پێی نەوترێ، خراپە.. هەندێ کەسیش ئاگادار بکەمەوە))

سەلوا: هەر بە تەلەفون بە یەکێ بڵێ ئیتر هەمووی ئەیبیسێ، هەر چیمەن بێنەو تەواو.

(( سەیارەیەکەی زوبێر کە بە بروسکە، بروسک و چیمەنی تیایە، چیمەن بە گریانەوە دائەبەزێت و دەست ئەکاتە ملی ڕێژوان و سەلواو گریان و ئەچێتە ژوورەوە.. بروسک دێت بۆ لای ڕێژوان، باوەشی پیا ئەکات و سەرەخۆشیی))

ڕێژوان (( بە گریانەوە)): تەلەفونێ بۆ یەکێکیان بکەم و بزانین مردوو شۆری ژنان بدۆزینەوەو بیبەین بۆ مزگەوت.(( تەلەفون ئەکا)) سڵاو کاک ئامۆ گیان.

Cut

دیمەنی – ٥٥٩ – ڕ/ د – بەر طب عدلي:

چەند پیاوێکی عەشایەرو مەدەنی وەستاون، لە ناویاندا تایەرو شەماڵ و ئاکارو برزو و هاوکارو شامورادو ئدریس))

تایەر: ئێ خۆ هیچ، لەو سەگبابە زیاتر نییە، من تەواو نائومێد بووم تازە بۆمان بدۆزرێتەوە.

شەماڵ: ئەرە وەڵا بە کائینات نادۆزرێتەوە.

ئاکار: هەوڵیتر ئەدەین پەلە مەکەن، با ئەم تەعزییە بەڕێکەین، من شتیترم لە خەیاڵایە.

برزو: وا ئەیهێننە دەرەوە با بچینە ژێر تابووتەکە.

Cut

دیمەنی – ٥٦٠ - / ن – ئۆفیسی گێلاس:
(( گێلاس بە تەنها دانیشتووە تێل ئەکات))
گێلاس: ١- نا نا ئاوا گیان، چۆن ئەهێڵم تۆ ئەرک بکێشیت، یا هەر ئاوا بە تەلەفون بۆم بخوێنەرەوەو من ئەینوسم، یان خۆم دێم........ ٢- زاڵم ئەمر نەکا ئاوا گیان، خوا کوێرمکا ئەگەر لەگەڵ دیارا فەرقتان بکەم.. بەڵام بەخوا یەکەم بە عەزێتی ئەزانم بۆ تۆو دووەمیش وەک وتم نامەوێ نینا ئەوە بزانێ، بۆیە باشترە من بە فرکانێک بێم........ ٣- باشە ماڵەکەت ئاوا بێ کورم، لەشت ساغ بێ، ئیتر خۆت چارەسەری بکە.. خۆ ئەگەر ناونیشانی هەرزانترینیشیانی لەسەر بنوسی، هەر زۆر مەمنون ئەبم...... ٤- تەبعەن کوالیتیشی هەر زۆر باش بێ....... ٥- باشە بەساقەی ئاوا گیان بم، عەزێتە چاوەکەم، زۆر زۆر سوپاس، ماندووم کردوویت........ ٦- هههە قوربانت.. با کاتی زیاترت نەگرم بەقوربان، کاتی خۆش بۆ تۆ، خواحافیزت بێ.
__________ Cut ______________

دیمەنی – ٥٦١ – ڕ/ ن – کۆمپانیای زوبێر/ ژووری زوبێر:
(( ئاوا بە تەنها دانیشتووە تێل ئەکا))
ئاوا: ١- نا توخوا ئەوە تۆ ئەڵێی چی گێلاس خان، من لەگەڵ دیارا چۆن فەرق ئەکەی، ئەمرم بەسەرابکەو خزمەتت ئەکەم.. ڕاستیەکەی لیستەکە زۆرە ئاوا ناخوێنرێتەوە، خۆم ئەیهێنمە خزمەتت.......... ٢- نا نا گێلاس خان، هیچ عەزێت نییەو خەمی ئەوەشت نەبێ بهێڵم نینا هەست بە هیچ شتێک بکات، حەز ئەکەی هەر ئەیدەم بە خۆیشی بتداتێ و نەشزانێ چییە، هههە هیچ خەمت نەبێ، نیو سەعاتێکیتر لە خزمەتدا ئەبم، هەندێ وردە ئیشی ئێرەم هەیەو یەکسەر دوای ئەوە ئەیهێنمە خزمەتت. ٣- توخوا وا مەڵێ، مەمنونیی چی گێلاس خان، ئەوە شانازییە بۆ من خزمەتێکت بکەم و کارێکت ڕایی بێ، بەسەرچاو لە هەموو بەشەکانا ناونیشانی هەرزانترینەکەشت بۆ ئەنوسم......... ٤- هەر ناوی شوێنێکم نەهێناوە کوالیتیی نزم بێت، ئەوە باشترین کۆمپانیاکانی پرۆدەکشن و چاپخانەی ئەم شارەن، ئیتر ئەوان خۆیان لەگەڵ دەرهێنەری خۆیان گرێبەست ئەکەن....... ٥- نا نا گێلاس خان، پورە گێلاس هەهە بە خۆشحاڵیەوە خزمەتت ئەکەم......... ٦- کاتی ئێوەش خۆش بێ، خوات لەگەڵ.
(( ئاوا لەسەر مێزو کورسیەکە هەڵئەسێت و ئەچێتە دەرەوەی ژوورەکەی خۆی.
___________ Cut ______________

دیمەنی – ٥٦٢ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( حەمە خدر لەبەردەمی هاوڕێ دا وەستاوە.. ))

خدر (( حەپەساو)): توخوا بەڕاستتە؟ ئەمە کەی؟

هاوڕێ: ئەمە تۆزێکە، کوڕەکەی تەلەفونی بۆ کاک ئامۆ کردووەو پێیوتووە دایکم مردووە. کاک ئامۆش بانگی کردم و پێی وتم هەمووان ئامادەکە بچین بۆ ناشتنەکەی.

خدر: وەی بەداخەوە، خوا عافویکا، ژنێکی زۆر بێدەنگ بوو، تۆ بڵێی ئێستا کاک زوبێر چی بۆ بکا، کە ناتوانێ بەدیاریەوە بێ؟

هاوڕێ: ئەوان زۆر دەمێک بوو جیا ببوونەوە، باوەڕ ناکەم زۆر خەفەتی لێ بخوا.

خدر(( ئەچێ بەرەو ئۆفیس)): نا نا هاوڕێ وامەڵێ.. کەواتە خێرا خۆتان ئامادەکەن.

هاوڕێ: بەسەرچاو کاک حەمەخدر گیان.

(( خدر ئەچێت بۆ ئۆفیسی وەکالەت و هاوڕێش خەریکی پاککردنەو هەڵگرتنی کەرەستەکانی ئەبێت))

Cut

دیمەنی – ٥٦٣ – ڕ/ د – سەرقەبرانی شاخە:

Mute

(( کۆمەڵێک پیاو لە سەر قەبران بڵاو بوونەتەوەو بەرەو جادە دێن و بڕۆنەوە، هەندێک سەیارەی وەستاو دەرئەچن و هەندێک ئەچنە ناو سەیارەکانیانەوە، لە ناویاندا شامورادو ئدریس و ئاکارو شەماڵ و تایەرو هاوکارو برزو))

Cut

دیمەنی – ٥٦٤ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( ڕاهۆزو سەرکۆ دانیشتوون))

سەرکۆ: کەواتە سەرچاوەی جموجوڵی پاشاکەیان کوژراوە.

ڕاهۆز: بەڵێ هەر لە دوکانەکەی خۆی هەڵیانواسیووە.

سەرکۆ: جا کەواتە پاشاش سەرچاوەی هەیەو زانیویەتی ئەو شاخە ناوە، ناپاکە لەگەڵیان.

ڕاهۆز: بە ڕاپۆرتی سەرچاوەکەی من بێت، ڕۆژێک لە کۆبوونەوەیاندا لەگەڵ شاخە لەسەر جادە، ماتۆڕسوارێکیان بینیوەو ئێستا گومانی سەرەکییان لەسەر ئەو ماتۆڕسوارەیە.. هەموویان ورد دیقەتیان داوەو ئێستا وەک ئەڵێن لە هەر شوێنێک ببیننەوە ئەیناسنەوەو شوێنی ئەکەون.

سەرکۆ: ئەو سەرچاوەیەت ئاگادار بکەرەوە، ئەم کارە زۆر گرنگەو فەرامۆشی نەکات، سات بەسات ئاگادار بێت، گەر لە ئیشە سەرەکییەکەی خۆشی دوورکەوێتەوە، هەقی بۆ ئەکەینەوە.

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم (( کۆژین بێتاقەتەو دێتە ژوورەوەو تحیة و وەڵام و دانیشتنیان)) گەورەم ئەمڕۆ قسەم لەگەڵ نارەوەنیش کرد، لای ئەوان دۆخەکە ئارامە.

سەرکۆ: ئەوەش باشە.. ڕائید کۆژین ناردم بە شوێنتا پێت ڕابگەیەنم بە یەکجاریی لە کەیسی هەردوو ناوچەی گێم و بلاک دوور خراویتەوە.

کۆژین: گەورەم، فەرمانی خۆتانە، بەڵام ئەگەر بەهۆی کەموکووڕیی ئەم ماوەیەوە بێت، ببورن خۆتان وەزعەکە لە من باشتر ئەزانن.

سەرکۆ: ڕائید کۆژین، تۆش هەم ئەفسەرو هەم کەسێکی وریای، ئەبووایە خۆت داوای دوورکەوتنەوەت بکردایە، بۆ ئەوەی بە سیفەتی ڕەسمیی نەچیتە کەیسێکی شەخسییەوە.

کۆژین: زۆر ببورە گەورەم، ڕاستە، بەڵام بەهۆی ئەم وەزعەوە هەموو شتێکم بیرچۆتەوە، خەیاڵم لای تەنەحی (( تنحي)) هەر نەمابوو.. بەڵام نەقیب ڕاهۆز لە ئێستادا ئاگادارترینە لەو دوو کەیسەو پاشخانیشی لەسەر کەیسەکەی ڕابردوو هەیە.

سەرکۆ: هەردوو کەیسەکەمان بۆ ماوەیەک کردووە بە یەک، تا بەرچاومان ڕوون ئەبێتەوەو شتێکمان لێ دەرئەکەوێ.. کەیسەکەش جارێ لای نەقیب ڕاهۆزە، کەسێکی شیاوت هەڵبژارد، باشت کرد.

کۆژین: ئەگەر دوور بەدووریش بێ من هەر هاوکاریی ئەکەم، تەنیایە.

سەرکۆ: نامانەوێ لە ئێستادا هەندێک کارڕایی قورس بکەین لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنراو نییە.. قسەمان لەگەڵ پۆلیس کردووە ئەوانیش دۆسیەیان بۆ کردۆتەوە، لەگەڵ نەقیب ڕاهۆز تەنسیقیان هەیە.. زۆر تەنیا نییە.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٥٦٥ – ڕ/ د – بەردەمی مزگەوت:

(( لافیتەیەکی مزگەوت بە ناوی " صبریە سعود کەیفی"یەوە نوسراوەو خەڵک ئەچێتە ژوورەوە بۆ تەعزێی دایکی ڕێژوان.. لە ناویاندا.. خدر، ئامۆ، ئاوا، هەندرێن، ئەردەڵان، هاوڕێ، کارە، ئەحە، لەتیف تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵێک بە جلی کوردییەوە))

Cut

دیمەنی – ٥٦٦ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نیناو گێلاس و ئاوا وەستاوە))

نینا: ئەوە چییە کردووتە بەڕێی کانی هەر نابینا نابینایەک پەیا ئەبی؟ تازە وا ئەڕۆینەوە، (( خاوکردنەوەو دەم و لچ شۆڕ کردنەوە)) ببووووورا.

ئاوا: جا تۆ بڕۆوە، ئێمە ئیشمان بە تۆ چییە؟ بۆ لای پووری خۆم هاتووم.

نینا(( خۆ تورە کردن)): وای لێهات؟ باش، بزانە ئیتر ئەمبینیتەوە؟

ئاوا: نەمانویست.

نینا(( تورەتر)): پورێ ئەچم دەموچاوێ ئەشۆم و مکیاژم تازە ئەکەمەوە، تا دێمەوە تکایە ئامادە بی.. بڕۆینەوە.

ئاوا: جا ئەم مکیاژە بۆ تازە ئەکەیتەوە؟

نینا: ئەی ئەڵێم ئەمە خوایە لەو ڕێگەو بانە کوڕێکی جوان ببینم و دڵم بیگرێ؟!

ئاوا(( گرژ)): هەی حەددت نەبێ.

(( زمان لێ دەرهێنان و دڵخۆش ئەچێتە دەرەوە))

ئاوا(( زەرفێک لە ژێر چاکەتەکەیەوە دەرئەهینێ و ئەیداتە گێلاس و ئەویش یەکسەر ئەیخاتە جانتاکەیەوە)): فەرموو پورێ گیان.. هەموو وردەکارییەکانیشە (( هەڵئەسێ))

گێلاس: قوربانت بم ئاوا گیان زۆر سوپاس، ماندووم کردی.. ئەوە بۆ کوێ؟

ئاوا: ئێوەش لەسەر ڕۆشتنەوەن، با دواتان نەخەم.

گێلاس: ئەی چاوەڕوانی نینا ناکەی؟

ئاوا: نا نا ئیتر لەسەر ڕۆشتنن، بەڵام حز ئەکەم پێی بڵێی تورە بوو ڕۆشت، مەمنونت ئەبم.

گێلاس(( پێکەنین)): باشە بەسەرچاو ها ها ها.

(( خواحافیزیی و چوونە دەرەوەی ئاوا))

Cut

دیمەنی – ٥٦٧ – ش/ د – چایخانەی نزیکە گەڕەک:

(( ئاکارو تایەرو شەماڵ و هاوکار دانیشتوون و برزو بە پێوە))

برزو: ئیتر من یەکجاریتر نایەمە مەجلیسی ئێوەوە، هەر بە چاک و خراپ ئەکێشن بە دەمما.

تایەر: دانیشە خۆت تووڕە مەکە، دانیشە با چارەسەرێک بدۆزینەوە.

برزو: دانیشتنی چی حەمەتایەر، ئەو دووانە (( مەبەستی شەماڵ و ئاکارە)) ناهێڵن فززەم لێوەبێت، تۆ زۆر بڵێی تۆ زۆر بڵێی، باوکم بیللاهی هەردووکیان لە من زیاتر ئەڵین و تا ئێستەش نەک چارەسەر، تەرەماشیشیان بۆ نەدۆزراوەتەوە.

ئاکار: دەدانیشە بزانین چی ئەفەرمووی، بەس زۆر نەفەرمووی هەتیو.

برزو: ئەها دیسانەوە پێم ئەڵێتەوە زۆر بڵێ.

شەماڵ: نا پێی وتی زۆر ئەفەرمووی، نەیوت زۆر بڵێ.. ئەوە ڕێزی گرتی چەنەباز.

هاوبیر(( بێزار)): دە توخوا ئەگەر بەسی نەبێ، دەبهێڵن بزانین چی بکەین.

تایەر: دەی فەرموو برزو (( شەماڵ و ئاکار گاڵتەیان پێدێت))

برزو(( بۆ شەماڵ و ئاکار)): ئێوە چاوتان دەرئەهات هەر پێبکەنن بۆ خۆتان (( بۆ تایەر)) من ئەڵێم ئەبێ چارەسەرێکی وا بدۆزینەوە، کە ئەمجارەیان بە پەلە کۆتایی پێ بێت و هیچمان لەدەست نەچێ.. ئینجا کە چارەسەرەکەمان باس کرد، ئەبێ ئەوەندە ورد بێ هیچ کون و کەلەبەرێکی تیا نەبێ، دەرفەت بدەینە دوژمنەکەمان و بتوانێ هەڵبێت، بۆیە پێویستە جارێ بەدوای چارەسەرێکا بگەڕێین.

شەماڵ(( پێکەنینی کەم و خەندە)): ئەوە غاز لێبیداوی ڕۆڵە؟!!! ئەی دوو ڕۆژە لە دوای کوشتنی شاخەوە بۆ چی ئەگەڕێین؟

ئاکار: گوێ بگرن پێتان بڵێم چی ئەکەین!

Cut

دیمەنی – ٥٦٨ – ش/ د – خێمەی ژنان:

(( لە خێمەی ژناندا: چیمەن و نارەوەن و تریفەو تیرۆژو سەلواو تافان و چەند ژنێکیترو مەلایەکی ژن قورئان ئەخوێنێ.. تریفە لە دوای فاتیحا هەڵئەسێ و ئەچێتە لای چیمەنەوە))

تریفە: خۆتان خۆش بن یارەببی، جێی بەهەشت بێ، زۆر ببورە قاوەخانەکە کەسی لێنییە، ئەبێ بگەڕێمەوە، ئەخیری ناخۆشیتان بێ یاخوا.

چیمەن: ئێوە خۆش بن تریفە گیان عەزێتت کێشا بەساقەوبم، تۆ بڕۆ چاوەکەم.

نارەوەن: پەلەت چی بوو؟

تریفە: بەخوا دە نوکەیان بۆ کردووم، ڕەنگە زۆر قەرەباڵغ بێ دایەگیان.

نارەوەن: دەی باشە لە ئەمانەتی خوایا بی، ئاگات لە خۆت بێ.

(( تریفە خواحافیزیی ئەکات و ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٥٦٩ – ڕ/ د – ژێر دارێک:

(( سەردار کە میری گەورەیە، دەستکێشی لە دەستایە.. تێل ئەکا، ئەکرێ ئۆڤەری لە پشتەوە وەربگیرێ، یان تا سەرسنگی دەربکەوێ))

میری گەورە: دڵنیابە ئەوەندە بێهۆش و گۆشی، ئاگات لە هیچ شتێکی دەوروبەری خۆت نییە ئەی خوێڕیی ترین پاشای سەر ئەرز................. ژەهری مار، بەڵێ دیارییەکەم بۆ شاموراد کە پێم ئەوتی گەورەیە، هەڵواسینی ئەو هەتیوە بوو، کە هەرچی نهێنیی شامورادو هاتوچوونی هەبوو بۆ لای تۆ، هەمووی ئەبرد بۆ ئەو گەنجە ئەقڵ بەتاڵانە.. لەوە نەئەترسای پاشا شوێنت بدۆزنەوەو بتکوژن.............. ئاااای کە چاک چارەسەرت نەئەکرد، ئەگەر فریات نەئەکەوتم، شوێن و مەکانت دۆزرابۆوە ئێستا.......... ئەبێ براکەی زایەرو ئەو گەنجانەی دەوریانداوە، هەر هەموو بکوژرێن با پێت بڵێم................ باشە نەجاتیشت بۆ ئەنێرم............. نا نا، نەجات شوێن و ڕێیان ئەزانێ، کوڕێکی بەدەستە، پێش هەر کەسێکی تر نەجاتیان ئەدا.

(( مۆبایل دائەخاتەوەو مۆبایلەکەی بە سیمکارتەوە ئەخاتە ژێر تایەی سەیارەکەی و بەسەریا ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٥٧٠ – ڕ/ ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و نینا دانیشتوون))

نینا(( غەمبارو تورە)): پێموت تۆ بە ناوی کۆمپانیای وەهمییەوە پسولەت بۆ پوورم دروستکردووە، زۆر دڵنیابە سکاڵات لەسەر تۆمار ئەکاو خراپ تیا ئەچی.. ئەی هاوار کەس هەیە ئەمە لەگەڵ خوشکی خۆیا بکا؟

ئاوا: (( ئاوا دێتە ژوورەوە)): ئۆخخخەی ئەوە تۆی وا ئەتبینم؟ چۆنی پرە گێلاس. (( تەنها تەماشای ئەکەن و وەڵام نادەنەوە)) چییە نینا؟ شتێک ڕوویداوە؟

گێلاس: وەڵا لە باوکە جوانەکەی بپرسە، خۆی لە خەڵک ئەکرد بە پۆلیس و شەق و زللەی ئەوەشاند، ئێستا خۆی پێویستی بە کەسێک هەیە شەق و زللەی تێ هەڵدا.

نینا (( بۆ شاردنەوەی باسەکە لە ئاوا، لێو ئەقرپێنێ)): پوورە گێلاس!!!!

ئاوا: کەواتە کێشەی گەورە هەیە، ئاساییە گەر نەتانەوێ بیزانم.. ئەڕۆم کاتێکیتر دێمەوە.

گێلاس(( بۆ نینا)): بەیانی دوو بەیانی هەموو دنیا ئەیزانێ، بۆ ئەم یەکەم کەس نەبێ؟

نینا: تۆ ئەم بە بێگانە نازانی.

ئاوا: ئەی تەبعەن. بۆ من بێگانەم؟

نینا: بەڵکو چارەسەرێکیشی لابێت و نەگەیەنرێتە دادگا.. من لەم بەینەیا تیا ئەچم.

ئاوا: بە دڵنیایی، من چارەملیشی ئەکەم.. سەر چییە؟

نینا: دەتوخوا تۆش بەسە بەردەوام جەوت هەیە!! ، کێشەکە گەورەیە.

گێلاس: خۆ پێموتی پارەی ڕیکلام هەڵی تەکاندووم؟ وابوو؟

ئاوا: بەڵێ.

گێلاس: گەڕام بۆ ناوی ئەو کۆمپانیایانەو دەستم نەکەوت لە هیچ شوێنێک، تەنانەت چوومە بەڕێوەبەرێتیی تۆمارکردنی کۆمپانیاکانیش لەوێش ناویان نەبوو، ئەوە چەند ڕۆژە ئەگەڕێم، دەرکەوت بێ ئەوەی ئەم داماوە (( مەبەستی نینایە)) ئاگای لێی بێ، هەموو پسوڵەکانی جەنابی کاک شۆڕشی برام، وەهمیی دەرچوون و ئەسڵ و ئەساسی نییە، نرخەکانیش من ئەڵێم سەد تۆ بڵێ دووسەد قاتیشی لەسەر من حساب کردووە.. باشە کاکە؟ ئەوەش برا!!

ئاوا: زۆر ئاساییە، دنیای ئەمڕۆ بە جۆرێکە، جێی دڵپاکیی و متمانە ناکاتەوە.. ئەگەر بتەوێ هەروابیت، ئەوا بەردەوام پێشکەوتەی دواکەوتە ئەبیت و بەس خۆت گوێت لە دەنگی خۆت ئەبێت.. با لەسەر ڕابردوو قسە نەکەین، چۆن بووەو چۆن کراوە..! گەر لە ئیشی من ڕازین، ئەم بابەتە بسپێرن بە من، نە ببرێتە دادگاو ناعاجزیشی لێ بکەوێتەوە.

گێلاس: ئاوا گیان برامە برا، چۆن متمانەم پێی نەبووایە؟

ئاوا: من پارەی خۆت بۆ ئەگێڕمەوە، تازە هیچ زەرەرێکیتر ناکەی، یان هیچت لە کیس ناچێ، با ئەو تۆزە متمانەیەش بە من بکەی، لێیگەڕێ بۆ من (( سەیری نینا ئەکاو وەک سوعبەت)) پورە گێلاس.

نینا: ئۆوهۆۆۆۆۆ.. هەر لەسەر سیک و سەودای خۆتی.. بابە ئەو پارەیە بە تەواوەتیی ناگەڕێتەوە، من ئەمشەو زۆر قسەم لەگەڵ کردو زۆر بێزاریم بەو کردەوەیەی دەربڕی، ئەڵێ پارەیەکم بۆ ڕیکلام خەرج کردووەو هەندێ وردە قەرزیشم لێداوەتەوە.

ئاوا: ئەوە کێشە نییە.. ئەی نەتبیستووە دایم ناوبژیوان زەرەر ئەکا؟

گێلاس: نا ئاوا ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ تۆ بۆ زەرەر بکەی؟ قەت ڕازیم نییە ئەوە بکەی، ئەبێت خۆی جگە لەو پارەیەی بۆ منی خەرج کردووە، ئەویترم هەمووی بۆ بگێڕێتەوە.

ئاوا: باشە هەمووی لێوەرئەگرمەوە.. ئا ژمارەکەیم بدەرێ قەرەج!

نینا(( زمانی لێدەرئەهێنێ)): بووین بە قەرەجیش؟!______________ Cut ________

دیمەنی – ٥٧١ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان بە تەنیا دانیشتووە، کەسێک داوای چا ئەکات و ئەردەڵان بۆی تێئەکا.. پاش کەمێک هاوڕێ لە ئۆفیسەکەوە دێتەوە سینییەک پیاڵەی بەتاڵی پێیە))

ئەردەڵان: دیارە کۆبوونەوەکەیان گرنگە، هەر زۆر گرنگ، وا ئاوایی هەموو کۆبوونەتەوە!

هاوڕێ: هەقمان چییە بەسەریانەوە، ئەوەندە ئەزانم، تۆزێکیتر ئەچن بۆ ماڵی ڕێژوانی کاک زوبێر بۆ سەرەخۆشیی.

ئەردەڵان: ئینجا خۆ هەموویان هەر لە تەعزێکە بوون و تەعزێش تەواو، ئیتر ئەم مەکرە چییە ئێستا ئەچنەوە؟

هاوڕێ: هەتیو تۆ زۆر خۆت بە خەڵکەوە خەریک ئەکەی، هەقت چییە بەسەرەوە؟ ئاخر بۆیە لە حەماڵییەکەشا پلەیەک ناچیتە پێشەوە.

ئەرەڵان (( پێکەنین)): بۆ حەماڵیش ڕوتبەی هەیە؟ (( هاوڕێ وەک بەزەیی پیا هاتنەوە سەیری ئەکا)) باجو ڕاست ئەکەی، ڕوتبە ڕوتبە سەرئەکەوی، تا ئەگەیتە پلەی حەمەخدر، خۆ لەوانەیە دواپلەش نەبێ.

(( بە سوعبەتەوە بە خێرایی بۆی ئەچێت و ئەکێشێ بە شان و ملیا.. لەولاشەوە نارەوەن و خدرو ئامۆو تریفەو تیرۆژو ئاواو هەندرێن ئەچن بۆ سەیارەکانیان، حەمە خدر بەرەوە لای ئەمان دێت، کاتێ هاوڕێ لە ئەردەڵان ئەدا))

ئەردەڵان: ئادەی ئادەی بەساقەوبم ئەولاتر، بەخوا هەمووی کۆڵنجی کردووە.

خدر(( ئەگاتە لایان)): خۆ شەڕتان نییە؟

هاوڕێ(( ئەوەستێ و لێی نادا)): نا نا، کاک حەمەخدر گیان، ئێمە هەر وەک خۆمانین قەت شەڕ ناکەین، ئەوە ئەیشێڵم.

(( خدر پێئەکەنێ و ئەڕوات و سواری سەیارەکان ئەبن)) _____ Cut _____

دیمەنی – ٥٧٢ – ڕ– ئێوارە/ن – نوسینگەی زەوی و زاری شۆڕش:

(( شۆڕش ڕەش داگەڕاوەو بێتاقەت.. سەردار دێت بۆلای، بە پەلە دێتە ژوورەوە))

سەردار: ها خێر؟ چی ڕوویداوە؟ وا باڵت لێڕواندم بگەمە لات.

شۆڕش: جا چی ڕووینەداوە.. دادم خۆی چووە پرسیاری کۆمپانیاکانی کردووەو نرخی ڕاستەقینەی زانیوەو هەر حەیاشم چوو.. باشە وات پێکردم؟

سەردار: ئەی تۆ نەتووت گێل و داماوەو هیچ نازانێ؟ ئیتر من چووزانم.

شۆڕش: نەوەڵا لە بەدبەختییەکەی من ئێستا هیچی لەدەست دەرناچێ و هەر بەسەرا خستمیە چاڵەوە.

سەردار: وەڵا ئەوە ناخۆشە شۆڕش، ئەی چۆن چارەسەری ئەکەی؟

شۆڕش: ئەی تۆم بۆ چی بانگکردووە، ئەڵێم پێکەوە بیر لە چارەسەرێک بکەینەوە.

سەردار: وەڵا ئیتر ئەوە بەینی خۆت و خوشکتەو خۆت باشتری تێ ئەگەی، من ناتوانم هیچ بڵێم.

شۆڕش: ئا.. تۆ بەس ئەزانی کەتنەکەم پێ بدەی، نازانی چارەسەریکەیت.

سەردار: دەی شۆڕش گیان خۆ تۆش مناڵ نیت بە قسەی من بکەی، بەخوا حەزت لێ نەبووایە، هەزاری وەکو من قسەی بۆ بکردیتایە، دەستت بۆ ماڵی خوشکی خۆت نەئەبرد.

شۆڕش: ئەک ئافەرین سەردار.. ئەشهەدوو ڕێک قسەی تۆیە.

سەردار: جا زۆرت لە پارەکەی خواردووە؟ من ئەوەی خۆمت بۆ ئەهێنمەوە سبەی.

شۆڕش: ئەمشەو ئەبێ بچم ئەستۆپاکیی خۆم بکەم، نابێ بگاتە سبەی.. ئەگەر ئەتوانی ئێستا بچۆ بیهێنەوە سەردار گیان.

Cut

دیمەنی – ٥٧٣ – ش / د – بەردەم خانوی پیاوەکانی پاشا:

(( تایەرو ئاکارو شەماڵ و برزو و هاوکار، بە شێوەیەکی بەربڵاو دابەش بوون بە بەردەرگای ئەو خانوەدا، کە پێشتر چاودێرییان ئەکرد، تا شاموراد ببرێ بۆ لای پاشا.. یەکێکیان بە دەمانچەوە لەبەر پشتێنیا، لە دەرگا ئەدات و لەوبەرەوە خاوەن خانووەکەیان لێ پەیا ئەبێ، بە تەمەنە))

خاوەن خانوو: فەرموون کاکە، ئەو خانووە چۆڵە. من ساحێبەکەیم، بۆ کرێتان ئەوێ؟

تایەر(( بەرەو پیری ئەچێت)): کرێی چی؟ خۆت بووی لەم ڕۆژانەیا تیابوویت؟

خاوەنخانوو: نەکاکە، ئەم خانووە بۆ کرێی کاتییەو پڕە لە هەموو پێداویستیەک، ئەگەر بۆ کرێتان ئەوێ، با قسە بکەین.

ئاکار: خاڵە گیان چەند ڕۆژێک لەمەوبەرماڵێکی تیا بوو، کێ بوون؟

خاوەنخانوو: وەڵا ژن و پیاوێکی کەڕولاڵی ئیختیار بوون، دوو کوڕیان هەبوو، وتیان تا بۆیاخی خانووی خۆمان تەواو ئەبێ، با دایک و باوکمان لێرە بێ.

شەماڵ: کەڕولاڵیش بوون؟

خاوەنخانوو: ئەرەوەڵا بۆ پرسیار ئەکەن؟

ئاکار: خاڵە ئێمە کوڕەکانمان ئەوێ خێرت ئەگا ئەگەر جێ و ڕێیان ئەزانی پێمان بڵێی.

خاوەنخانوو: جا من چوزانم کوڕیان کێ بوون ڕۆڵە؟ تا شوێن و ڕێیان بزانم.. بە ناوی ئەو پیرەمێردو پیرێژنەوە نوسیومەوەو ئەگەر ئێوە سەر بە دەوڵەتن، با پێتان بڵێم کێ بوون.

هاوکار: نا خاڵەگیان کوڕەکان؟!

خاوەنخانوو: کوڕ عەقدیان بۆ کردن و ڕۆشتن، وا بزانم دوو یان سێجاریش هاتن سەردانیان کردن، چوزانم کێ بوون؟ ____________ Cut ____________

دیمەنی – ٥٧٤ – ش/ د – باخی حەوشەی ماڵی ئاكۆ:

(( ئاكۆو دیارو گێلاس))

ئاكۆ: نا تازە بوو بەدیاریی، با پارەشت زۆر بێت، ئەوی منیش هەر هی خۆتە.

دیار: دە دوو دەوڵەمەندەكە شتێكیش بدەن بە من، خۆ كەس نازانێ چەندتان هەیەو چەندتان نییەو منیش لە سەری هەفتەیا دینارم پێ نییە.

گێلاس: ئەو كاتە بە پێی تەمەنی خۆت خەرجانەت ئەدرایە، ئەی بیرت نایەت دوو ساڵ لەمەوپێش ڕۆژانە بوو؟ مناڵ تا ئەگەڕێتەوە نابێ پارەی زۆری لەبەردەستا بێ، بە پێی تەمەن، ئیتر نە كەمترو نەزیاتر

(( لە دەرگا ئەدرێ.. دیار ئەچێت ئەیكاتەوەو بەخێرهاتنی خاڵە شۆڕش ئەكاو هاتنە ژوورەوەو سەلامی گەرم و لالووتیی گێلاس))

شۆڕش: ئەوە چییە دادە گێلاس؟ بە جددی پێت وایە پارەی تۆ بخۆم و فێڵت لێ بكەم؟ بە ڕاستی توشی شۆك بووم ئەو كوڕە هات، من ویستم لە تەلارەكەیا بۆت بكەم بە سوپرایزو پێت بڵێم ئەم پارەیەشت هەیە.. حەیف ئاوا بیرت لێكردمەوە.. سا بە قەبری باوكمان هەر نایەم بە لای تەلارەكەتاو هەر عیلاقەشم نابێ بەسەرتەوە، تۆ ئاوا دڵكرمێ بیت؟!

ئاكۆ: ئەوە خۆی لێی بپرسە، منیش پێموت قەت لەو بڕوایەدا نیم كاك شۆڕش شتی وای لێ بوەشێتەوە.. بەڵام كاك شۆڕش ڕێگەی سوپرایزەكەی تۆش نەئەچووە ئەقڵەوە، زۆر دڵخۆشم كە هاتی و ڕاستیت پێ وتین.. جا ئەم پارەیە باش بوو ئەوەندە نەبوو لە چاو پارەی تەلارەكەیا، بە ڕاستی بیڵێم، كەسمان بەرگەی سوپرایزی پارەی تەلارەكەمان نەئەگرت، هەر یەكسەر جەڵتە لێی ئەداین هههە.

گێلاس: بەخوا ئیتر مامەڵەی ژن ئاوایە شۆڕش، بەزەیی بە تاك هەزارییەكیشا دێتەوەو لێی ئەكۆڵێتەوە.. لەبەرئەوە وەك ئاكۆ وتی بەرگەی سوپرایزێكی تر ناگرین، بۆیە بڕیارمدا خۆم تەلارەكە بكەم.

شۆڕش: هەرچەندە بە تۆ ناکرێ و زەحمەتی زۆری ئەوێ، بەڵام بە دڵی خۆتان بکەن.. ڕاستە من پارەی خوشکەکەم بە پارەی خۆم زانی و کەمێک دەستم تێخست، بەڵام زۆر نابا ئەوەی ماوە، ئەوەشت بۆ ئەگێڕمەوە، خەمت نەبێ من دڵی تۆ بە هەموو دنیا نادەم دادە.

گێلاس: کوا چی ماوە؟

شۆڕش:ئەوی بە قەرز لام ماوە!

گێلاس: بەڵام ئاوا هەمووی هێنایەوەو هیچت لەسەر نەماوە!!

شۆڕش(( ڕامانێک)): ئا ئا وابوو، وەڵاهی خەریکە ناوی خۆشم بیر ئەچێتەوە.. وابوو لە ماڵەوە ئەویشم لابوو، خستمەوە پاڵ پارەکە.

گێلاس: شۆڕش ئەگەر ئاوا ئەو پارەیەی تەواو کردووە پیم بڵێ، من ئەیدەمەوە بە ئاوا، تۆ قەرزارم بی باشترە لەوەی بێگانە پارەیەک بدات و بەوە ڕێکمانخاتەوە.

شۆڕش: نا نا دادە دڵنیام زۆریش، جا من چۆن ئەهێڵم بێگانە پارەم بۆ بداتەوە.. بێگانەش کێ؟ ئاوا!!!

گێلاس: ئیتر تۆ کچت هەیە شۆڕش، لەبەر خۆت نا لەبەر کچەکە، ئەگەر وایە ئەو یارییانە مەکە.. خەڵکی ئێستا بە راست پێت بڵێم، کەسیان جێی متمانە نیین.. ئەوە دیاری کوڕم نییە؟ بڕوا بکە متمانەی پێ ناکەم.. جا خوا ئەزانێ گەنجێکی وەک ئاوا کە لە هیچی کەم نییە، چۆن بیر ئەکاتەوەو چی لە مێشکایە؟

شۆڕش: خەمی هیچت نەبێ دادە، زۆر وریام.. ئاواش ئەو کوڕە خراپە نییە کە یەکەم شەو هەر لێرە تێی گەیشتم، کەسێکی باش و دڵپاکە.

گێلاس: ئیتر بۆ خوا پێت ئەڵێم، وریا بە تێنەکەوی.

ئاکۆ: ئەرەوەڵا تا وریا بین لەم ڕۆژەیا، هێشتا کەمە.. سوپرایزی خۆش خۆشیش هەیە.

Cut

ديمەنی – ٥٧٥ – ش/ د – باخی حەوشەی ماڵی شۆڕش:

(( نینا بە جلێکی هاوینەی ڕاقیی و جوانەوە، بە باخەکەدا دێت و ئەچێت و تێل ئەکا ))

نینا: ١- نا نا نا دوور نەچی هەی شێت! پورە گێلاسم پێی وتم تێلت بۆ بکەم بەم شەوە، تا پۆلیسەکە نەهاتۆتەوە......... ٢- تۆ هیچ پارەیەکت خستۆتە سەر ئەوەی باوکم و دابێتتەوە بە پورە گێلاس؟........... ٣- ئاخر چوزانم، تۆ شێتی و ئەوەش لە ئیشی تۆ ئەچێ.. باوکم بە پورە گێلاسی وتووە تۆ هەر پارەیەکت لای من ماوە، کە پورە گێلاس پێی وتووە هیچم لات نەماوەو ئاوا هەمووی هێناوەتەوە، ئیتر باوکم قسەی گۆڕیوەو وتویەتی هەموویم داوەتەوە.. ئەزانی ئەگەر شتی وات کردبێ لێت نابورم؟ ........ ٤- نا زۆریشم پێ ناخۆشە ئاوا.. من نامەوێ لەگەڵ هیچ هاوڕێیەکما پارە ببێتە بابەت و جێی قسەوباسمان.. بە ڕاستیی هەڵەت کرد.. با بە ئاشکراتر قسە بکەین، بۆ ئەوەی دڵی من بەدەست بێنی ئەمەت کرد، بەڵام دڵنیابە هەر زۆر زۆر دوورکەوتیتەوە، تازە دوور لەبیرکردنەوەی من شتێکت کرد، کە چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەئەکردی.. بەداخەوە ....... ٥- ئەی ئەوە نییە هەوڵتدا؟.......... ٦- هەتیو زۆر زمانلووسیت، بەهەرحاڵ سوپاس بۆ لێکدانەوەت نەک بۆ پارەکە.. دڵنیابە تا مردن سوپاست ناکەم بۆ ئەو پارەیە...... ٧- بەڵام لە دواجارا هەر بۆ منە، لەوە تێئەگەم، خۆ بە شاخەوە نەلەوەڕاوم؟ ........... ٨- (( پێکەنین )) نەوەڵا تۆش بە ژیانت چاوت پێی ناکەوێتەوە هەههە ئەی ئێستا چی بە پورە گێلاس بڵێم؟ ............ ٩- چی بکەم؟ ئەی خۆ ئەو هەموو حقایەتەی تۆم بۆ لەبەر نەکرا، چوزانم لەوە زیاتر شتێک بڵێم؟........... ١٠- بەس تکا ئەکەم هیچیتر نەدەی بە باوکم لەبەر خاتری من، ئەگینا ئەتروتینێتەوە........ ١١- بڵێ ڕێوی بە شاگرد ڕاناگری؟ بەخوا وایە هەههە .....

ديمەنی – ٥٧٦ – ش/ د – باخی نادیەکی ڕاقی:

(( ئامۆو ئاوا ئەخۆنەوەو ئاوا تێل ئەکا ))

ئاوا: ١- باشە، خۆت و پورە گێلاسیش سەر سەرم ئەمرکەن.......... ٢- نا شتی وا نەبووە.. من تەنها پارەکەی باوکتم داوەتەوە بە پورە گێلاس و هیچیتر (( هەڵئەسێ و لە ئاوا دوور ئەکەوێتەوە )) ......... ٣- توخوا تۆ شێتی یان من؟ ئەگەر شتێکی واشم لەبەر تۆ کردبێ، بۆ ئەوەی ئەوان ڕێککەونەوەو تۆ ئاسوودەبیت، ئەمە تاوانەو شایانی لێ نەبوردنە؟ (( نینا بێدەنگە )) ها؟ قسە بکە! (( وەڵامی نییە )) دەی کەواتە بێدەنگیی نیشانەی دڵ فەریحییە؟ هههەه ...... ٤- گوێبگرە نینا.. ئەگەر پارە وەسیلە بێ بۆ دڵ ڕازی کردنی کەسێک، ئەوا ئەو کەسە تۆ نیت و گەر بە پارەش دڵت ڕازی بێ، هیچ بایەخێکت نامێنێ لای من...... ٥- نەخێر ئەو هەوڵە بۆ تۆ نەبوو.. یەکەم خوشک و برایەکم پێ ڕێکخستەوە، دووەم بۆمانەوەی تۆ بوو لای گێلاس خان، کە ئەگەر ئەوەم نەکردایە، ئەو بابەتە ئەبووە مایەی کێشەی باوکت و پورت و تۆ لەوێ نەئەمایت، کە نەمئەتوانی ئەوە بهێنمە پێش چاوی خۆم تۆ ون بیت لە چاوم.. سێیەمیش، نەک ئەوە، من هەموو هەموو شتێکت پێشکەش ئەکەم بە خاتری ئاسوودەبیت، هیچیتر.. تۆ ئاسوودەبەو هەرچی هەیە بە جەهەنەم....... ٦- پێموتی ئەو پارەیە بۆ تۆ نەبووەو هیچ مەمنونیشت نیم سوپاس بکەی، چونکە سوپاسکردنت لە زیادەیە، شتێک بۆ تۆ نەکرێ چۆن سوپاسی لەسەر ئەکەی؟...... ٧- دڵنیابە قەت داوای ئەو قەرزەت لێ ناکەمەوە کە بۆ تۆ نییە، ئەزانم خەمتە (( پێکەنین )) ........ ٨- بڵێ خۆی هەموو پارەکەی داوەتێ، با لێرەیا ئەو کێشەیە داخرێ، باشە بەقوربان؟ ......... ٩- ئافەرین، ئەوە باشترین چارەسەرە...... ١٠- نا نا نینا گیان، زۆر لە ڕێوی وریاترم، بەڵام ئەمە پێویستیی بوو....... ١١- کچێ نەبەخوا زۆر فەقیرو داماوم، دەست بخەرە

١٢- تۆ لەو بڕوایەدای منیش ئەوەنە داماو بم دەست بخەمە دەمتەوەو تاقی بکەمەوە؟ (( پێکەنین)) .......... ١٣- ئەوە لە کوێی بەم نیوەی شەوە، دەنگ دێ لە دەوروبەرت؟ ............ ١٤- گرفتی من نییە لە هەر شوێنێک بیت، بەلامەوە ئاساییە.. بەڵام ئەوەی بەلامەوە ئاسایی نییە، ئەوەیە دوا تکات لێ ئەکەم هیچ پارەیەکیتر نەدەی بە باوکم، ئەگینا بە هەموو ژیانت گوێت لە دەگم نابێتەوەو بە یەکجاریی بیری خۆمت ئەبەمەوە.......... ١٥- مەبەستم ئەوە نییە تۆ تێی ئەگەی، ئەوە دەنگی سەیارەکەی هات، گەڕایەوە، شەوت شاد، بای! (( مۆبایل دائەخات و ئەڕواتە ژوورەوە))

Cut

دەممەوە نازانم بیگەزم........ ١٢- تۆ؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟ هههههه نەوەڵا ئەبەد چاوەڕوانی ئەوەت لێ ناکەم......... ١٣- جا نازانم پێت خۆش ئەبێ یان نا؟ ڕاستییەکەی لە نادیم......... ١٤- وەیش قوربانت بم، بۆ لەبیرتام؟ واو چەند خۆش بوو ئەو قسەیە واوووووو ...... ١٥- باشە شەوت شاد بێ جانانە.

(( مۆبایل هەڵئەگرێتەوەو ئەچێتەوە سەر مێزەکە))

ئامۆ: گەیشتنە قسەی تایبەت و نهێنییش؟ هههه

ئاوا: کچی وا جیرم نەبینیوە ئامۆ.. ناچێتە ژێر باری قسە، خۆی ئەدزێتەوە.

ئامۆ: دەی ئەوە جوانییەکەی بەسەریا سەپاندووە، ئەی خۆ بە دوو قسەو پێت ناڵێ وەرە داوام؟

ئاوا: زۆری ئەوێ تا ئەگاتە ئەوە.

ئامۆ: پشوو درێژبەو کاتی بدەرێ.

ئاوا: کورە خۆ ئێستا هەموو کاتم هی خۆیەتی، کوا من کاتم بۆ ماوەتەوە؟؟ هههه.

(( پێکەنین و دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٥٧٧ – ش/ن - ماڵی تایەر / ژووری تایەر:

(( باوک و تایەر دانیشتوون))

تایەر: باوکە کە ئەو برادەرانەم هاتن، بێزەحمەت تۆ بچۆرەوە لای دایکم.

باوک: کوڕم منیش بۆ ئەوە هاتم پێت بڵێم تووو خوا لەگەڵمابە، ئیتر ناو ڕەفیق و مەفیق تەرککە، هەر ڕەفیق نەبوو براکەتی بە هەڵەیا بردو بەو حاڵەیان گەیاند؟ تۆ دەرسێ لەوە وەرگرە کوڕم.

تایەر: باوکە گیان، خۆت ئەزانی من لە ژیانما دەستم نەبردووە بۆ شتێک هی کەسێکیتر بێ، کاکەم خوا عافویکا خۆی حەزی لەوە بوو.. ئینجا خەمت نەبێ لە تەمەنێکیشا نیم نەزانم کێ باشەو کێ خراپ؟ ئەوانەی تۆ ئەیانبینی کە من لەگەڵیانا هەڵسم و دائەنیشم خراپیان تیایە؟

باوک: لەخوا بەزیاد بێ نەشوکر (( ئاکار دێتە ژوورەوە. سەلام و وەڵام و بەخێرهاتن، باوک هەڵئەسێ)) دەی بۆ خۆتان دانیشن من ئەچمە لای ئایشێ.. (( بەڕێکردن)).

ئاکار: ئێهـ ئەوە دەرکەوت هەر بۆ ماوەیەکی کەمیش لەو ماڵەیا بوون، کورە ئەمانە گرەویان لە شەیتانیش بردۆتەوە.

تایەر: بە ناوی ئەو دوو داماوەشەوە خانووەکان ئەگرن، خوا ئەزانێ ئەوانیش خەڵکی کوێن.

ئاکار: ئێستا تەنها شامورادمان بە دەستەوە ماوە.

تایەر: جا سوودی چییە کە ئەویش شوێن و مەکانیان نەزانێ؟

ئاکار: من ژمارەکەیم لایە.. تەلەفونی بۆ ئەکەم و ئەچمە لای.

تایەر: تۆ بچۆ سەرێکی لێ بدە بزانە ئەڵێ چی؟

(( شەماڵ و هاوکار دێنە ژوورەوەو سڵاو و بەخێرهاتن))

Cut

دیمەنی – ٥٧٨ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆو خدر دانیشتوون))

خدر: ئا بە دایکیشتم وت، وتی لە ئۆفیس بە تا خۆشم دێم.

ئامۆ: ئیشەکە بۆ من ئاسانە کاک حەمەخدر، کێشە نییە، تۆ ئەتوانی ئەم ماوەیە بە دڵی خۆت بێیت.. من سەرپەرشتییان ئەکەم، بەڕاستی بە هۆی هەندرێنیشەوە سترێسێکی وا لەسەر ئێرە نییە.

(( دەنگی شەنیا دێت لە دەرەوەو هەندرێن داوای لێ ئەکات نەچێتە ژوورەوەو کچەکە سوورە لەسەر چوونە ژوورەوەو دەرگا ئەکاتەوەو هەندرێنیش بەداوایەوە))

ئامۆ: فەرموو فەرموو بەخێربێی!

شەنیا: جەنابت خاوەنی ئێرەیت؟

# (( ئەڵقەی بیست و هەشت))

خدر(( بە هێمنیی و خەندەوە)): نەئەبووایە گەنجێکی خوێنەواری وەک بەڕێزت، سڵاوێکت بکردایە؟

شەنیا: ببورن، کارمەندەکەتان هیچیان بیر نەهێشتم.. (( بۆ ئامۆ)) جەنابتی یان ئەم برادەرەیە؟

ئامۆ: فەرقی نییە، هەردووکمانین.

شەنیا: ماڵێک ئەناسم نانی شەوێیان نییە..

ئامۆ: باشە.

خدر: وەک سڵاوەکەت بیرچوو، دانیشتنیشت بیرچوو. فەرموو دانیشە.

شەنیا(( بەدەم دانیشتنەوە)): جا تۆش بەزمیت! من بۆچی هاتووم و تۆش هەر لە خەمی ڕۆتینای.

خدر: بەڵێ ببورە فەرمووو!

شەنیا: ئەمڕۆ هەندێ خواردنم لەماڵی خۆمانەوە بۆ بردن و وتم بزانم چۆن ئەیگوزەرێنن، کە چووم باوکەکە لە ماڵەوە نەبوو لەگەڵ یەکێ لە کچە وردەکانی.. کە پرسیارم لە دایکەکە کرد، وتی چووە ئەویان ببا بۆ بێ سەرپەرشتان و نیازیشی وایە ئەوانیتر بفرۆشێ.. کسپە لە جەرگمەوە هات.

ئامۆ: بەداخەوە، لە ئێستادا ماڵی وا هەیە؟

شەنیا: قوربان من بەدوایانا ئەگەڕێم و حاڵەتی خراپی زۆریتریشم بینیوە، ئەوە جەنابتانن نازانن خەڵک چۆن ئەژی! ئەگینا بەڵێ ئێستا هەر زۆر زۆریشە.

ئامۆ: جەنابت ناوت چییە؟

شەنیا: شەنیا.

ئامۆ: ئەی کێشەت چی بوو لەگەڵ کارمەندەکە؟

شەنیا: کێشەم نەبوو، بەڵام داوای هەندێ خواردنم کرد بمدەنێ و بیبەم بۆ ماڵەکە، (( نارەوەن دێتە ژوورەوەو گوێ ئەگرێ و سڵاو ناکات، ئامۆو خدر لەبەری هەڵئەسن و خدر ئاماژەی شوێنێکی بۆ ئەکا)) ئەم برادەرەش وتی ئەوە ئەبێ خاوەن کۆمپانیا بڕیاری لێ بدا، نەیئەهێشت بێمە ژوورەوە.. (( بۆ خدر)) ئەوە ئەم ژنەش سڵاوی نەکرد، دەی گلەیی لێ بکە.

نارەوەن(( خەندە)): بۆ دەمهەراش تۆ هێشتت؟ ئەڵێی بەڕوو لە دەمتا تەقیوە (( پێکەنین))

شەنیا: من لەسەر خەڵکی هەژارو برسیی زۆر دەمهەراشم دایە گیان، مەبەستم ئەو برادەرە بوو هەر خەریکی گلەییە. (( پێکەنینی هەمووان))

ئامۆ: ئەوە دایکمەو ئەویش کاک حەمەخدر.. تۆ لەم ساتەوە بەرپرسیارێتیی ئەو ماڵە بە من بسپێرە.. هەندرێن یەکێک لەگەڵیا بنێرە بەشی مانگێک ئازوقەیان بۆ بنێرەو مانگانەش بەبێ ئەوەی بیرت بچێ، ئەوەیان بۆ ئەنێریتەوە (( لەسەر کاغەزێک شتێک ئەنوسێ)) ئەو پارەیەشیان لە تەیب بۆ وەرگرەو بیاندەرێ.. بۆم نوسیووە مانگانە ئەو پارەیەیان بۆ ببڕێتەوەو بیدا بە شەنیا خان.. تۆش شەنیا خان دەستت خۆش بێ و بچۆ کچەکەشیان بگێڕەوە نەیباتە بێ سەرپەرشتان.. ئەمرێکیترت هەیە؟

هەندرێن: بەسەرچاو. (( ئەچێتە دەرەوە)) دوایی وەرە بۆ لای من.

شەنیا: بەڕاستی سوپاس، ئێوە کەسی خێرەومەندو بە دەست و دڵی ئەم شارەن، نموونەتان زۆر بێ (( ئەیەوێ بە مۆبایل ڕەسم بگرێ، ئامۆ دەستێکی ئەخاتە پێش دەموچاوی))

ئامۆ: ئەوە چی ئەکەی؟

مەترسە بۆ بڵاوکردنەوەمە هههە، من ڕۆژنامەنوسم.

ئامۆ: ئەوەم بۆ بڵاوکردنەوە نەکرد، تەنها بە هاناوەچوونی ماڵە هەژارێکەو هیچیتر.

شەنیا: هەڵبەت کاک... ناوی جەنابت؟

ئامۆ: ئامۆ.

شەنیا(( بۆ خدر)): هەڵبەت کاک ئامۆ ئەزانێ ئێوەش لاریتان لەو خێرە نییە، بۆیە پرسی نەکرد.

خدر: ئەو خۆی سەرپشکە هەرچییەک ئەکات و ماڵی خۆیەتی، ئێمە هەقمان چییە بەسەریەوە؟

شەنیا(( بۆخدر)): گلەییت نەما؟

خدر: بە هیچ جۆرێک (( پێکەنین))

(( شەنیا سوپاس و پێزانین و خواحافیزیی، و ئەچێتەدەرەوە))ـــــ تابع ــــ Cut ـــــ

دیمەنی – ٥٧٩ – متبوع – ڕ/ د – بەردەرگای ئۆفیسی وەکالەت:

(( شەنیا بە دڵخۆشیی دێتە دەرەوە، هەردوو مستی توند ئەکات و بۆ خوارەوە ڕایئەتەکێنێ))

شەنیا: واو، چەند چانسم هەبوو، خۆ کوڕی دوکانی کارەباکە بوو... خۆ ئەوە لەم کونەیا خۆی شاردۆتەوە بۆیە نەئەبینرا، ئیتر قەت پێی لێ نابڕم.. واو کە خۆش بوو.

(( بە لای ڕاستا بەرەو لای چاخانەکەو بادانەوە بەلای ڕاستا بۆ لای هەندرێن))

Cut

دیمەنی – ٥٨٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و نینا ))

گێلاس: ڕۆژانە وەفدێکی وا بهاتایە ئەینەخشاند!

نینا: بەڕاستی باش بوو، ئیتر ئوتێل وایە پورە گێلاس، ڕۆژی وا هەیە وەک ئەمڕۆ، ژوورت نامێنێ و میوان ئیزن ئەدەی، ڕۆژی واش هەیە کەم ئەبێ.. بەڵام بەهاران باشترە، گەشتوگەڕان هەیە.

گێلاس: خواردنی باش هاتووە؟

نینا: هەر کە بەیانی زوو وەفدەکە ئاگاداریان کردینەوە، دەستبەجێ تێلم بۆ ئاوا کرد، ئیتر ئەبێ ئەوەی ناردبێ بەش بکا.

گێلاس: ئیزعاجی نەکردووی؟

نینا: هاتنی وەفدەکە، یان قەرەباڵغیی و حساباتەکە؟

گێلاس: خۆت بێ ئاگا نیشان مەدە، هههە ئاوا ئەڵێم.

نینا: ئۆو بڵێ شێتەکە، نەبابە، زۆر باشە. بۆ؟ خۆی کەسێکی چۆنە بەڕاست؟ دیارەلە زووەوە ئەیناسی.. ئیزعاجە؟

گێلاس: نەوەڵا بۆ خوا قسە بکەین، تا خوا حەزکا هەموو مناڵەکان و دایکیشیان، یەک لەیەک ڕێک و پێکترن.. بەس ئیتر باوکەکەیان لەسەر ئەو ئیشە پیسەی کردی، ئاوای بەسەرهات.

نینا: ئیشی چی و چی بەسەرهات؟

گێلاس: ئای، لەسەر پیاوکوشتن و تلیاک و ئەو شتانە حوکمەت لە سێدارەی دا.

نینا: ئۆووو! بەڕاستتە؟

گێلاس: ئەی خۆ ڕەنگە باوکیشت بزانێ؟!

نینا: ئەی منالّەکانی چۆن هێشتوویانە باوکیان ئەوە بکا؟ ئەی ژنەکەی؟

گێلاس: بە حساب کەسیان ئاگایان لێ نەبووە.

نینا: ئەی تۆ چۆن بانگت کرد بۆ ئێرەو ئەو خواردنەت پێ سپارد؟

گێلاس: جا منالّی داماو چی بکا؟ ئەو لە هەموو کەسێکیش باشتر بوو بۆ ئێمە.. کردەوەکانیشی دەریانخستووە خراپ نییە.

نینا: وەلا نەمزانیبوو.. با تۆزێ لێی بگرمەوە.

گێلاس: بۆ هیچت هەیە لەگەلّیا تا لێی بگریتەوە؟

نینا: نەوەلا هەر سوعبەت و شتی واو ئیشی ئێرە.

گێلاس: نا خراپ نییە مەیکە بە گرێ.. چۆنی لەگەلّیا هەروابە.

نینا(( پچڕ پچڕ)): نازانم.. ڕەنگە نەتوانم و... ڕەنگە.....

گێلاس: چەتیو خۆشت نەوێ؟

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ٥٨١ – ڕ/ د – دوکانی قصابیی تایەر:

Mute

(( کڕیارێک گۆشت ئەکڕێت و باوک دانیشتووەو تایەر لێی ئەکاتەوەو ئەیکێشێ، کڕیار پارە ئەدات و ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ٥٨٢ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٥٧٨ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن و ئامۆ))

خدر: بەڵێ ئیتر بە یارمەتیی ئێوە، ئەم یەک دوو مانگە لایان ئەبم، تا تاقەتم ئەچێ.

نارەوەن: دەی ئەگەر بیری ئێمەت نەکرد، هەر نەیەیتەوە.

خدر: توخوا دڵت شتێ نەکا نارەخان.. باوەڕ بکە زۆرم پێناخۆشە ئەڕۆم.. بەڵام گەر ئەم ماوەیە نەچمەوە دێکەی خۆمان و پشوویەکی باش نەدەم، ئیتر هیچم پێ ناکرێ.. تەواو ماندووم.

نارەوەن: دەی باشە کوڕم، خوا ئاگای لێت بێ و بە سەلامەتیی. لەسەر خێر.

ئامۆ: ڕاستە ناهەقت ناگرم، بڕوا بکە ئێمەش ئەو ماوەیە لە میسر نەبووینایە، ڕەنگە خۆمان بکوشتایە.

نارەوەن: ئاااى هەر ژنی داماوە ئەبێ بخزێتە کونی ژوورەوەو هەموو بەرپرسیارێتییەکەشی لەسەر شان بێ و هەر ئەبێ تەحەمولیش بکا.

Cut

دیمەنی – ٥٨٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٥٨٠ – ڕ/ن –- ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و نینا ))

نینا(( ترس و خەجاڵەتیی و قوڕگی وشک ئەبێ)): وەڵا پورێ... بڵێم چی؟ پێم خراپ نییە.

گێلاس: بەڵێنی هیچت پێداوە؟

نینا: هەی نەخۆرانی بێ.. بەڵێنی چی؟ بەڵام لەوەدا بووم بزانم چۆن کەسایەتییەکە، بەڵام وەک تۆ ئەڵێی ڕەنگە بەکەڵک نەیەت.

گێلاس: من نەموت خراپە، وتم باوکی ئاوای بەسەرهاتووە، ئەم بڵێ چی؟

نینا: یەعنی پێت باشە؟

گێلاس: ئەوە پەیوەندیی بەخۆتەوە هەیە، من چەند ساڵە ئەیاننناسم عەیبیان نەبووە، ئیتر ئەگەر تۆش ئەزانی ئەو باسە کارت تێ ئەکا، ئەوە لای تۆیە.

نینا: ئەی خەڵک ئەڵێن چی؟

گێلاس: ئینجا تۆ بۆ خەڵک ئەژیت؟

نینا: کەمێکیش بەڵێ.

گێلاس: دەی ئەو خەڵکە با کچی خۆیانی نەدەنێ، لەو بڕوایەدای پەکی بکەوێ؟

نینا: نازانم... توشی دڵەڕاوکێیەکی توند بووم.

گێلاس: من بۆ ئەوەم نەوت ئومێدت کاڵ بکەمەوە.. ئەو کوڕە چەند ساڵە دوکانی هەیەو کەسێک گلەییەکی لێ نەکردوون و نەهاتۆتە سەریان.. بەڵام ئیتر ڕێگەی باوکیان، ڕێگەی ئەمان نەبوو، کچێ هەردوو کوڕەکەی لە تاوا سەری خۆیان هەڵگرت، سێ چوار مانگێک هەر کەس نەیزانی لە کوێن.. ئیتر ئەوە بوو دوژمنەکانی باوکی تەقەیان لە دایکیشی کردو باش بوو پێوە نەبوون.....

نینا (( قسەی پێ ئەبڕێ)): چۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆن؟

گێلاس: ئا ئا لەگەڵ ئەو حەمەخدرەی بەردەستەکەیانا بوو، سەلامەت دەرچوون.. جارێکیشیان هاتنە سەریان بۆ دزیی و یەکێک لە دزەکان هەر لە کۆڵانەکەی خۆمانا کوژرا.

نینا: ئۆو پورەگێلاس، ئەو قسانە لە فیلم ئەچێ.

گێلاس: ئیتر هەرچییان هەیەو نییە من پێم وتی و خۆشت سەرپشک بە.

نینا: کچێ پورێ گیان بەخوا پشکت تیا نەهێشت هههههه.

گێلاس: نا نا ئەتوانی ورد بیری لێبکەیتەوە، بڕیاری بەپەلە، سوچێکی کەلە.

(( نینا لێکدانەوەو قژ ڕێکخستنەوەو گێلاس بێدەنگ))

Cut

دیمەنی – ٥٨٤ – ڕ– عەسر/ن- د – دوکانی لەنگە:

(( شاموراد تێل ئەکات و ئدریس نزیکیەتی))

شاموراد: نا نا کوڕم نەکەی بیکە بە خاتری خوا!

ئاکار(( دەنگ)): ئەی شاخەی ڕەحمەتیی پێی وتم جەنابت ڕازیت بێم ئیشتان لەگەڵا بکەم.

شاموراد: نا باوکەکەم ئێوە تازە لای ئەو جەماعەتە ناسراون و هەر کامێکتان لێم نزیک بنەوە، من و ئەوەشتان بە دەردەکەی شاخە ئەچین، بۆ تۆ وا ئەزانی شاخە بۆ کوژرا بابە؟

ئاکار: بۆ پێیان زانیبوو لەگەڵ ئێمە بوو؟

شاموراد: پاشاکە تەلەفونی بۆ کردم و وتی خەڵکی خۆمان شاخەی لای تۆی لەگەڵ ئەو گەنجانەدا بینیوە.. ئیتر حسابی خۆتان بکەن و لە ڕایی خوا نەیەن بەم دەوروبەرەیا.. خۆشتان ئاگاتان لە خۆتان بێ ڕۆڵە با کەسیترتان هیچتان بەسەر نەیەت.

(( خدر٣ بە جلوبەرگێکی هەژارانەیترو ڕوخسارێکیترەوە لەبەر دوکان وەستاوە، ڕیش و سمێڵ و قژی درێژی ماش و برنجی و شەرواڵ و کراسی زۆر کۆن و پێڵاوی شڕ))

ئاکار: زۆر سوپاس کاک شاموراد بۆ ئامۆژگارییەکانت، بێخەمبە ئیتر نایەین بە لاتا.

(( دوای خواحافیزیی))

شاموراد(( بۆ خدر٣)): ئەگەر بۆ خێر هاتووی؟ نییە خوا بتداتێ.

خدر٣(( بەخۆیا ئەڕوانێ و زمانی ئەیگرێ بەبەردەوامیی)): بۆ ئەوەندە هەژار دیارم، بۆ خێر هاتبم؟

شاموراد: ئەی چی ئەکەی لەو بەر دوکانەو چاوت بڕیوەتە ناو چاومان؟

خدر٣: باشتر بوو چاوەڕوان بم تا تەلەفونەکەت تەواو ئەکەی، بۆ شتێک هاتووم.

شاموراد(( هەڵئەسێت و ئەچێتە بەردەمی)): فەرموو برا؟!

خدر۳: بۆ دوکانێکی چۆڵ ئەگەڕێم، لەمناوە شکی نابەن؟

شاموراد: دوکانی کرێ شک نابەم، ببورە.

خدر۳: من نۆکاو و پاقلەفرۆشم.. شوێنێکم ئەوێ عەرەبانەکەمی لێڕاگرم و هیچیتر.

شاموراد: ئەگەر وا ئەزانی ئیرە دوکانی مەشروبە؟ دیارە چاوت باش نییە (( دەست ئەداتە پارچە جلێک)) نابینی؟ لەنگەیە لەنگە کوێراییت داهاتووە؟

خدر۳: هەرچەندە وا دیارە پیاوێکی زۆر عەسەبی بیت، بەڵام باشیت، ئەوە لە ڕوخسارتا ئەبینم.

شاموراد: قسەی لوسم بۆ مەڵێ تا عەرەبانەکەت ڕاگری، وتم ئێرە دوکانی مەشروبفرۆش نییە.

خدر۳: ئێ خۆ برا هەر مەشروبفرۆش پاقلەو نۆکاوخۆر نییە.. ماشەڵڵا جادەکە قەرەباڵغەو بەینی خۆشمان بێ، بێ بەشت ناکەم.

شاموراد: چیت ئەوێ؟

خدر۳: ڕێمبە لە شوێنێکا بوەستم.

شاموراد: هەر ئەبێ بەر دوکانی من بێ؟

خدر۳: لای سەرەوە هەرچی دوکانێ هاتۆتە سەر ڕێم پێم وتوون، ئەڵێن لە دوورو نزیکی دوکانی ئێمەوە قەدەغەیەو بۆت نییە بوەستی.. بەڵام کە لە دوورەوە ڕوخساری جەنابتم بینی، نازانم بۆ موحیبەتت چووە دڵمەوەو بە پیاوێکی باشم زانیت؟ دڵنیام بە هەڵەشدا نەچووم، ئیتر کەیفی خۆتە.

شاموراد: بڕۆ لە سەروو منەوە بوەستە.

خدر۳: بەردوکانی خەڵکەو نەیانهێشت.

شاموراد: ئای خوایە لەم بەلایەی بە توشمەوە بوو!

ئدریس: دەی گەورەم، با بۆخۆی بوەستێ، چ زیانێک بە ئێمە ئەگەیەنێ، خۆ چێشتخانەمان نییە ڕێ لە سەیارە بگرێ؟

خدر٣: ئەها.. کەواتە ئەبێ پێت بڵێم گەورەم.. گەورەم خێرت ئەگاتێ دڵم مەشکێنە.

شاموراد(( بەدەنگی زۆر نزم، بۆ ئدریس)): ئەی تۆ بڵێی نەنێررابێ؟

ـــــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــ

دیمەنی – ٥٨٥ – ڕ– عەسر/ د – حەوشەیماڵی نیگار:

(( دەرگای دەرەوە کراوەتەوە.. شەنیا لە جەڕەس ئەدات و بە پەلە ئەچێتە ژوورەوە بۆ حەوشەکە، دەوران بە جلی ماڵەوە دەرگا ئەکاتەوە.. شەنیا هەردوو مەچەکی دەوران ئەگرێت و بە دەوری خۆیا ئەیسوڕێنێتەوەو دەورانیش هەردوو مەچەکی ئەگرێ))

شەنیا(( زۆر دڵخۆش)): دۆزیمەوە، دۆزیمەوە، دۆزیمەوە!

دەوران(( متحیر)): چیت دۆزییەوە شێت و وێت؟ سووک با دایکم گوێی لێ نەبێ.

نیگار(( دێتە ناو دەرگاکە.. ژنێکی دەوروبەری پەنجا ساڵ، جوانیی زۆری پێوە دیارە)): با دایکت چی نەزانێ؟ بە پوری خۆت بڵێ شەنیا گیان، چیت دۆزییەوە؟

شەنیا: ئیشم دۆزییەوە نیگار خان ئیش.

نیگار: جا ئەوە ئەم هەموو هاتوهاوارەی بۆ چی بوو ڕۆڵە؟ هەهەه.. یاخوا پیرۆز بێ و بەدڵی خۆت بێ.

شەنیا: هەر زۆریش لە سەروو دڵی خۆمەوەیە نیگار خان گیان.

نیگار: دەی بەخوا ئەوە ئیش نییە شتیترە، بۆ خۆتانی باسکەن (( ئەچێتەوە ژوورەوە))

دەوران: بینیت؟ یەکسەر تێگەیشت.. ئادەی بزانم کێ؟

شەنیا: ئەها کوڕەکەی وتم لە دوکانی کارەباییەکەیا بوو؟.. ئامۆ.

دەوران: دەی دەی بیرمە.. ئادەی لە کوێ دۆزیتەوە، ئەترسم فرێیاندابێ و لە بەرمیلی خۆڵا دۆزیبێتتەوە.

(( شەنیا مستێکی پیا ئەکێشێ و دەوران ڕائەکا لە دەستی و ئەویش بە باخ و حەوشکەدا ڕاوی ئەنێ))

Cut

دیمەنی – ٥٨٦ – ڕ – عەسر/ د – باخی ماڵی شۆڕش:

(( نینا لەسەر کورسییەک دانیشتووە، خەفەتبار، هەردوو دەستی لە پشتی سەریدایەو جاروبار یاری بە قژی ئەکا ))

نینا: ئۆۆۆف خوایە!

**<u>نینا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:**

باشە چی ئەبوو ئەم هەموو کێشەیەی بەدواوە نەبووایە؟ ئەوە بۆ من ئەوەنە نەگبەتم خوای گەورە؟ وایە، من هەر شتێکم ویستبێ، قەت پڕاوپڕ بە دڵی خۆم دەستم نەکەوتووە.. لەسەر باوکی تەقە لە دایکی بکرێ، لەسەر ئەویش تەقە لە من ئەکرێ.. کچێ ئەوی بۆچییە؟ دوژمنەکانی باوکی دەستیان بگاتە هەریەکێکیان ئەیکوژن.. دڵیشم نایەت لەبەر ڕۆڤان و باوکم بڵێم با بچین بۆ وڵاتێکیتر.. ئای خوایە گیان لێت ئەپاڕێمەوە بە دڵی خۆمم لەگەڵ بکەیت و هەرچییەک باشە ئەوە بهێنیتە ڕێم.... بیرکردنەوە لەم شێتە منیش شێت ئەکا، با بچم بەلای چێشتەکەوە، بەڵکو کەمێک بیرم بچێتەوە.

**<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>.**

(( هەڵئەسێ و بەرەو ژوورەوە ئەچێت))

Cut

دیمەنی – ٥٨٧ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٥٨٤ –ڕ– عەسر/ د – دوکانی لەنگە:

(( شامورادو ئدریس و خدر٣ ))

ئدریس( بەدەنگی نزم)): گەورەم ئەگەر ئەوان بینێرن، ئەیسەپێنن بەسەرمانا، دوای ئەوە شتێک ناکەن ئێمە گومانیان لێ بکەین؟

خدر٣: گەورەم ئەمرت بەچی بوو؟ بڕۆم یان دڵم ناشکێنیت؟

شاموراد: زۆر مەڵێ جارێ، با پرس و ڕاوێژێ بە یەکتر بکەین.

خدر٣: کورە گەورەم ئاخر نۆک و پاقلە پرس و ڕاوێژی بۆچییە؟ ئەیهاوار هههە ئەگەر نەگبەتیی من نەبێ؟

شاموراد: مادام ئەوەت وت بوەستە، بەراستی داماو دیاری چونکە خۆت بە نەگبەت ئەزانی.. بەس ئەبێ قبوڵی ئەوە بکەی، تا تۆ لێرە بی، من پێت بڵێم نەگبەت.

خدر٣: وەی بەسەرچاو، خوا ئەکا تۆ ڕێم ئەدەی، هەرچیت پێ خۆشە ئەوەم پێ بڵێ.. ئەی کرێم چەند لێوەرئەگری؟

شاموراد: کورە کرێی چی نەگبەت؟ دەی بۆ حەیاشمان نابەی؟

خدر٣: یاخوا ماڵت ئاوا بێ، بەسەری خۆم لە دوورەوە دڵم پێی وتم ئەم پیاوە باشە دڵم ناشکێنێ، زۆر سوپاست ئەکەم گەورەی دڵنەرم، من بەیانی زوو عەرەبانەکەم ئەهێنم.. زۆر مەمنون.

شاموراد: بیهێنە نەگبەت، هەر لە تۆمان کەم بوو.

شاموراد (( دوای خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر٣)): ئەزانی بۆ ڕێگەمدا؟

ئدریس: بۆ گەورەم؟ لەبەر ئەو قسەیەی؟

شاموراد: کورە قسەی چی ئەوە لەبەر ئەو واموت.. ئەڵێم با یەکێک هەبێ ئاگای لێمان بێ و ببێ بە قەڵغانمان.. لە هەر شوێنێکەوە تەقەمان لێ بکرێ، بەر نەگبەت ئەکەوێ.. ئەی بۆ ناوم نا نەگبەت ها؟ هههە

دیمەنی – ٥٨٨ – ش/ن - قاوەخانەی تریفە:

(( تریفەو هەڵشۆ لە جێی کاشێر))

تریفە: باشە حەیام مەبە تۆزێ سووک قسە بکە.

هەڵشۆ(( کەمێک توورە)): تۆ ئیمانت لە کەللەما نەهێشتووەو داواش ئەکەی سووک قسە بکەم؟

تریفە: دەی من چیم وتووە؟ ئەڵێم هەڵشۆ گیان وا نابێ.. چاوەکەم تۆ ماڵ و حاڵت هەیە، ناکرێ ئاوا فەرامۆشمکەیت.. ئێستا بە شەویش من نازانم تۆ لە کوێیت.. یان هاتوویتەوە من نوستووم، یان هەر نایەیتەوە.. ئاخر چۆن وا ئەبێ.

هەڵشۆ: ئاخر بۆ کوێ بێمەوە؟ تۆ نیوەی شەو ئەگەیتەوە ماڵەوە.

تریفە: دە کەسێکی بۆ بدۆزەرەوە بیکرێ.. بەڵێن بێ بۆت ئەبم بە ژنی ماڵەوەو بازاڕێکیش ناکەم، بەس بۆ ئەوەی پێکەوە بگەڕێینەوە ماڵەکەمان، خەریکە بە دەستی خۆمان وێرانی بکەین.

هەڵشۆ: با پێت بڵێم، ئێمە زیاتر بەم قاوەخانەیە ئەژیین، نەک ئیشە بێخێرەکانی من.. دوای ئەوە ئەمە دیاریی باوکی ڕەحمەتیتە چۆن لەناوی ئەبەین؟

تریفە: دەی کە وا ئەزانێت و ئیشەکانی تۆ بێخێرە؟! وەرەوە ئێرەو هاوکاریییم بکە، بیلاهی منیش زۆر ماندووم.

هەڵشۆ: نا نا نا، من سەرەتاش پێموتی ناتوانم لە شوێنێکا ئیش بکەم خۆم بنیاتم نەنابێ.. با پێت بڵێم، ئەوەی دەستیشم ئەکەوێ کۆی ئەکەمەوە تا ئیشێکی باشی پێ بنیات بنێم.

تریفە: ئای خوا لەدەست تۆ؟! لەسەرێکەوە هی باوکی ڕەحمەتیتەو نابێ بفرۆشرێ، لە سەرێکیشەوە قاوەخانەی خۆم نییە.. پێم بڵێ ئێستا چی بکەم بەدەست تۆوە؟ شتێکم پێ بڵێ کە دەهریم نەکاو چارەسەر بێ.

هەڵشۆ: وەڵا ئەم بەزمەشمان زیادی کرد.. دە مادام لێم دەهری ئەبی تریفە خان، ئەوە هەر بە یەکجاریی بە دڵی خۆم ئەکەم و تۆش چی ئەکەی برۆ بیکە.

تریفە: ئاخر پەشیمان ئەبیتەوە هەڵشۆ!

هەڵشۆ: وتم چی ئەکەی بیکە، منەتم پێت نییە.

تریفە: دە سا لەمەودوا چاوت بە یەک دیناری ئەم قاوەخانەیە ناکەوێت و یەک دیناریشی بۆ ماڵەوە خەرج ناکەم و چاوت بە یەک چێشت و نانی ماڵیشەوە ناکەوێت.

هەڵشۆ: وەڵا وتیان زۆر چاومان پێی کەوتووە، چەتیو چەند مانگیش ئەبێ من هەر لە دەرەوە نان ئەخۆم، مەگەر نیوەڕوان کە هەڵئەسی چایەکم بدەیتێ؟!

تریفە: زۆر سوپاس.. بووین بە چەتیویش؟

هەڵشۆ: ئەی خۆ باوکت نەماوە ئەی ئێستا هەتیو نیت؟ چەتیویت و ئەولاتریش.

تریفە: من ئاوا لەگەڵ تۆیا دەرنابەم.

هەڵشۆ: وتم چی ئەکەی بیکە، ئەوی لە سەیارە کڕین و فرۆشتنەکە دەستم ئەکەوێ، سەروبەر بەشم ئەکا.

تریفە: هەڵشۆ ئەگەر ژنیترت بە دزییەوە هێناوە، ئاشکرایکەو پێم بڵێ!

هەڵشۆ(( بەدەم ڕۆشتنەوە)): ئۆوهۆۆۆ لەم ئەقڵە کەرانەیەی تۆ!!!

Cut

دیمەنی – ٥٨٩ – ش/د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن لە باخەکەدا کەمێک بێتاقەت و تیرۆژ دێت بۆلای))

تیرۆژ: ئەوە چییە ئەڵێی ترشت خواردووە وا دەم و چاوت ڕووناکیی تیا نەماوە؟

نارەوەن: کچم هەر تۆ ڕووناکیت تیابێ، من نامەوێ بەساقەوبم.

تیرۆژ: ئەترسم لەوە بێتاقەت بووبی، کە وتم ئیتر منیش ئیشم ئەوێ؟ توخوا ئەگەر ئەوەیە ڕاست پێم بڵێ دایە، بەخوا هەر بیریشی لێ ناکەمەوە.

نارەوەن: نا بەچاوی تیرۆژ بەهیچ جۆرێک.. زۆر بە پێچەوانەوە، لە دڵەوە حەز ئەکەم ئیشێکت دەستکەوێ ئەوەنە نەخزێیتە کونی ژوورەوە.. بیریشت بۆ ئەکەمەوە دڵەکەی دایە.

(( تیرۆژ لە پشتەوە باوەشی پیا ئەکات و ماچی ئەکا))

دیمەنی – ٥٩٠ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس بە تەنها لەسەر مێزو کورسییەکەی دانیشتووەو پاش کەمێک نینا دێت.. دوای سڵاوو دانیشتن))

گێلاس: ئەڵێم نینا.. ژمارەی میوانەکان وەرگرەو تەلەفونێ بۆ ئاوا بکە، بزانە خۆی چی ئەنێرێ؟

نینا(( بێتاقەت)): پورێ گیان ببورە ئەڵێم ئەو ئەرکە لەمەولا بە دیار بسپێری، خۆش نییە کچێکی وەک من هەموو ڕۆژێک پەیوەندیی بە گەنجێکی غەریبەوە بکا!

گێلاس: ئەوە کەی قسەیە نینا گیان؟ خۆ تۆ بۆ ئەحواڵ پرسین تەلەفونی بۆ ناکەی؟.. ئەمە ئیشە، ئەتوانی سنوری باشی بۆ دابنێیت و لە ئیشەکە زیاتر نەهێڵی لەفز هەڵبێنێ.. ئەگەر ئەشزانی قسەی بێ سەروبەرو ئەملاولا ئەکا.. چی زۆرە وەکالەتی ئازوقە زۆرە، ئەچینە لای یەکێکیتر.

نینا: نا پورێ گیان خوا هەڵناگرێ شتێکی نەوتووە دڵگران بم.. ئەترسم کەسێکیتر ڕاسپێری، ئەو وا نەبێت و گۆشت و مریشکەکەش نەگرێتە ئەستۆی خۆی.

گێلاس: تێگەیشتم.. کەواتە تەلەفونەکەی بۆ بکە هههە

نینا (( بێتاقەت خەندە)): ژمارەی میوانەکانم لەڕێوە وەرگرت. ،(( تەلەفون ئەکا.)) سڵاو کاک ئاوا.. بێزەحمەت خواردنی ئەمڕۆمان بۆ بنێری.

ئاوا((( دەنگ)): بەڵێ باشە نینا خان بەسەرچاو.. خواردنی چەند .......

نینا (( مۆبایلەکەی دائەخاتەوە، گێلاس زۆر پێ ئەکەنێ)) : ئەوە بە چی پێ ئەکەنی پورێ؟ هەڵەیەکم کرد؟

گێلاس (( بەدەم پێکەنینەوە)): ئەوەندە شڵەژایت، وا بزانم داوای ژمارەی میوانەکانیشی کرد، تۆ داتخستەوە بەسەریا، هههە.

نینا (( ئەیەوێ خۆی بگرێت و پێ نەکەنێ، لەپڕا پێکەنینی زۆر)) ڕاست ئەکەی هههە،

ئەی چی بکەم بۆی بکەمەوە؟

گێلاس: نا کەمێ سەبر بگرە بزانین خۆی ئەیکاتەوە (( زەنگی مۆبایلی گێلاس و تەماشای ئەکا)) ئەوە بۆ منی کردەوە، دیارە لێت توورەیە.

نینا: کەیفی خۆیەتی.

گێلاس: ئەلو ئاوا گیان باشیت کورڕم!

(( لە میوتیدا قسە کردنی گێلاس بە مۆبایل و خۆتورڕە نیشاندانی نینا))

Cut

دیمەنی - ٥٩١ - ڕ/ د - قصابی تایەر:

(( تایەرو ئاکارو شەماڵ و هاوکار.. باوک لە دەرەوەیە))

هاوکار: نا، تا نەگەینە شوێنێک من دەستم ناچێتە ئیش برا.

تایەر: نابێ کاکە، تۆش ماڵت کەوتووە بەسەراو خەرجییان ئەوێ، بگەڕێوە بۆ ئیشەکەت.

هاوکار: خەمی ئەوەت نەبێ خوا پەک ناخا، ئێستە بزانین چی بکەین؟ ئەی برزو بۆ نەهاتووە؟

شەماڵ: کورە بابە برزو ئەبێ سەری پاترییەکەی دەرکەی ئەوسا بێدەنگ ئەبێ، (( پێکەنینی گشتیی)) هەر لێیگەڕێ.

ئاکار: کاکە من وازم لێهێناوە سەر ناکەمە سەری، تۆش تۆزێ کەمیکەرەوە!

شەماڵ: دەئاخر نایبڕێتەوە، هەر کە دەستی پێکرد، ئیتر وردە وردە گەرم ئەبێ و هیچیش نالێ، ئینجا سەری پاترییەکەشی هەر من ئەزانم لە کوێیە! هههە.

تایەر: وابزانم هیچ چارەسەرێکمان پێ نەما.

ئاکار: شاخەش فت و دەرکەوت شوێنی پیاوەکانی پاشا خوێڕییەکەشیان ماڵی بەکرێگیراوی ڕاخراو بوو، هەر بۆ ماوەیەک بوو، شامورادیش تۆقیوەو هەر ناوێرێ دەرفەتێکمان بداتێ بیبینین.

هاوکار: تەنها یەک شتمان بەدەستەوە ماوە.. من ژمارەی سەیارەکەیانم گرت.

شەماڵ: هەتیو تۆش بووی بە برزو! ئاخر ژمارەی سەیارە لەم شارە زلەیا لە کوێ بە ئێمە ئەدۆزرێتەوە؟

هاوکار: کاکە ئێمە هەموو شتێکمان لە دەستچووە، تەنها ئەو ژمارەی سەیارەیە ماوە.

شەماڵ: ئاخر کەرە پێم نالێی سوودی ژمارەی سەیارە چییە؟

هاوكار: ئەیدەین بە پۆلیس و ئەوان ئەیدۆزنەوە.

ئاكار: حەمە تایەر ئەڵێی چی؟

تایەر: ئێوە كەیفی خۆتانە هەر چ بڕیارێك ئەدەن، بەڵام من بە دەستی خۆم نەینێم بە ناوچەوانی ماتۆڕسوارو پاشا سەرسەرییەكەیانەوە، دڵم ئۆخەی ناكات و داناسكنێم.

شەماڵ(( بۆ هاوكار)): كەواتە تۆ دیژلەمەیەك بانگكەو خۆت بە كلۆكەیەوە مەشغولكە، زوو لێ نەبیتەوە باش؟ (( بە دەنگی بەرز)) كاكە دیژلەمەیەكی كولاوكولْ.

ئاكار: بەڵام ئاكار تۆ لە كوێوە ژمارەی سەیارەكەیانت گرت، خۆ لەگەڵمانا نەبووی؟

هاوكار: دوای ئەوەی لە ئیش تەواو بووم خۆم پێ نەگیراو چوومە بەردەمی ئەو ماڵەی شاخە ناونیشانی بۆ هەڵدابووین، كەستانی لێ نەمابوون و هیچ جوڵەیەكیش لە ماڵەكەیا نەبوو، تەنها سەیارەكەی كاك شامورادم ناسیوە.. وتم بزانم چی ڕوو ئەدا، ئیتر من هەر وەستام، كە هاتنەوەو كاك شامورادیان داگرت، زانیم خۆیانن، ئیتر ژمارەكەم گرت و ئینجا كە كاك شاموراد دابەزی و چووە سەیارەكەی ........

شەماڵ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئەی هاوار برزومان لێ نابڕێ؟! باشە كاكە گیان تێگەیشتین مێشكمان مەبە.

تایەر: هەر ئەیدۆزینەوە بۆ كوێ لە دەستمان ڕائەكا؟

ئاكار: ئێوە یەك دوو ڕۆژ مەجالی من بەن.. شتێ بە شتێ ئەكەم.

شەماڵ (( ئەڕوانێتە دوور)): هەستن بڵاوەی لێكەن، برزو هات.

ئاكار: دڵم خۆش بوو وامزانی ئەڵێی ماتۆڕسوارەكە هات.

هاوكار: جا بۆ بڵاوەی لێ بكەین؟ كێ ناڵێ هەواڵێكی پێ نییە.

شەماڵ: من من ناڵێم. هههه

(( برزو دێت و سلاو و وەڵامدانەوەو دانیشتن)) ____________ Cut ________

دیمەنی – ٥٩٢ – ڕ/د – بەر دوکانی لەنگەکە:

(( لە ژوورەوە ئدریس دیارەو خدر٣ش لە دەرەوە لەسەر عارەبانەیەک نۆک و پاقلەی داناوە، ئاگر لەژێر نۆکاوەکەدا هەیە، لەبەر خۆیەوە بە ورتە ورت بە جۆرێک ببیسرێ، لە گۆرانی فۆلکلۆریی "تۆزەکا" ئەم کۆپلەیەی ئەڵێ))

خدر٣: ماڵمان لە ماڵیان دووره

بەللەکی ئەڵێی تووره

بە مسقاڵی ئەفرۆشێ (( ئەکرێ ئەم دێڕە نەڵێت وەک ئەوەی نەیزانێ، زمانیشی لە گۆرانیا نایگرێ))

کافرەی لەخوا بەدووره

(( بە دەنگی بەرزو بە ئاوازێکی تایبەت)) ئەوە نۆکاوە گەرمەکەیە، پاقلەی کوڵیووووو ! پاقلەیە پاقلەی کوڵیووووووو!!!

ئدریس(( لە ژوورەوەو بەرەو بەردەمی دوکان دێت)): هەتیو سمکۆ! کەمێ دەنگت کزکە مێشکت بردم، کاکە وا بکەی مشتەرییەک ناوێرێ بێ بەم ناوەیا.. هەرچییەکیش ئەڵێی بە گۆرانییەوە بیڵێ، زۆر باشە زمانت نایگرێ.

خدر٣: بەسەرچاو کاک ئدریس، بەڵام بەخوا چی بکەم دەنگم خۆی زلە.

ئدریس: هەتیو هەر دەنگ زلیەکەت نییە، ئەو گۆرانییە ناخۆشەیە مێشکی بردووم.

خدر٣: دەی بەخوا ئەو گۆرانییەم پێ ناگۆڕرێ، مەگەر دەنگم داگرم.

ئدریس: کە "گەورەم" دەرکەوت نەشیرێنی، ئەگینا دەرت ئەکا.

خدر٣: باشە بەسەرچاو، ئهـ (( دەمی خۆی ئەگرێ)) قوڕوقەپ. (( مشتەریی دێت و بەرێی ئەکا)) کاک ئدریس؟!

ئدریس(( بەتەوسەوە)): بالێ.

خدر٣: ئەڵێم.

ئدریس: جا بۆ ناڵێی؟ وەڵا جێیەکت دەستکەوتووە، پاشایانە.

خدر٣: یەعنی بەڕای تۆ پاشاو وەزیروگزیر لە شوێنی وایا ئەژین؟

ئدریس: قسەکەت بکەو شششش (( پەنجەی دۆشاو مژەی ئەخاتە سەر دەمی خۆی)) ششششش.

خدر٣: بەڵێ.. ئەڵێم ئەو دوکانەی ئێوە ئەوە ئەهێنێ دوو کەس خەریکی بێ؟

ئدریس: تۆ یەک زەڕە بۆت نییە باسی ئەوە بکەی.

خدر: مەبەستم ئەوەیە کرێکەی پەیا ئەکا؟ هەموو ئەمڕۆ سێ چوارێکم بینیوە هاتبن، ئەویش خوا ئەزانێ شتیان کڕیوە یان نا.

ئدریس: مەبەستت هیچ نەبێ سمکۆو خۆت لە ئیشی خڵکا هەڵمەقورتێنە، ڕسق لای خوایە بە چاو نابینرێ.

خدر٣: دەی ئەوە ڕسقەکەی من بە بەرچاوەوەیە، هەرچی بفرۆشم هەموو ئەوانەی مەبەستیان بێ ئەتوانن بیژمێرن لەگەڵما.

ئدریس: جا تۆ زۆر ئەڵێی سمکۆ.. کاکە ئێمە پێی ڕازین، کێشەی تۆیە؟

خدر٣((پێکەنینی سوعبەت)): نا نا دیارە ئێوە ژێر بە ژێر ئیشی جوملە ئەکەن و کەس نایزانێ، ئەگینا بەخوا مەعیشەت وا ناچێ بەڕێوە!

ئدریس: جا بۆ یەکجاریی کامێرای چاودێریشمان ناخەیتە سەر تا بزانی چی ئەکەین و چی ناکەین؟ ناسمکۆ.

خدر٣: نا نا عەفو، مەبەستم ئەوە نەبوو.

ئدریس: مەبەستت هەرچیەکە هەردوو چاوت دەرئەهات، وا مەکە کە گەورەم هاتەوە پێی بڵێم و دەرتکا.

خدر٣: خۆت تورە مەکە کاکە دڵەکەم، من و تۆ کوڕی فەقیرو هەژارین، نابێ لە یەک تووڕە بین.. ئەگەر ئاوا تورەبی و جنێوم پێ بەیت، ئیتر هیچ پرسیارێکت لێ ناکەم.. من وەکو برای خۆم سەیرم کردی، بەخوا بڵێی بمرە ئەمرم، چۆن تووڕەت ئەکەم گیانی من.

ئدریس: وایە کوڕە هەژارم، بەڵام پێم ناخۆشە پرسیاری وام لێ بکرێ.

خدر٣: باشە کاکە عەفو، ئیتر پرسیار ناکەم.

ئدریس: لەبارەی هەر شتێکەوە قسە ئەکەی بیکە، بەڵام باسی ئیش مەکە، تاقەتی جواب دانەوەم نییەو تورەش ئەبم.

خدر٣: نا نا ئیتر هیچ! هەر لێیگەڕێ.

(( ئدریس ئەچێتەوە ژوورەوەو خدر٣ش بە دەنگێکی نزمتر، نۆکاوی گەرم و پاقلەی کوڵیوەکە وەک جاری پێشوو ئەڵێتەوە، بە ئاوازەوە))

Cut

دیمەنی – ٥٩٣ – ڕ/ن ئۆفیسی شۆڕش:

(( شۆڕش دانیشتووەو سەردار دێتە ژوورەوە، شۆڕش لەبەری هەڵئەسێت و تەوقەو سڵاو و وەڵام. شۆڕش لە زەرفێکی گەورە تابلۆیەک دەرئەهێنێت، پۆرترێتێکی سەردارە))

سەردار: ناشێ بڵێی ڕەسمەکەی بۆ تەواو کردووم؟

شۆڕش: کاکە تۆ ڕۆڤان بە چی ئەزانی، دوێنێ خۆی فۆتۆیەکی لە فەیسبوکەکەت وەرگرت و هەر دەوروبەری سەعاتێکی پێچوو،تەواوی کرد.

سەردار: ئەی خوا تەمەن درێژیکاو بۆت بهێڵێ، بەڕاستی جوانە، تۆ سەیریکە، هەر بە ڕاست ئەڵێی خۆمم.

شۆڕش (( پێکەنین)): ئەی خۆتی برا خۆتی، خۆ منیشی نەکێشاوە.

سەردار(( ئەیخاتەوە زەرفەکە)): ئەوە دیارییەکی باشی قەرزارم.

شۆڕش: نە بابە پێویست ناکا، خۆم لەبری تۆ شتێکی ئەدەمێ و ئەڵێم، هی مامە سەردارتە.

سەردار: نا نا هیچی مەدەرێ شۆڕش، ئەمە شتێکە بە پارە هەڵناسەنگێنرێ، من ئەمەوێ شتێکی بۆ بدۆزمەوە، بەهای هەبێ نەک نرخ، وەک ئەوەی خۆی.. ئا ئەوە باسی پارەت کرد، باقیی قەرزەکەی خوشکەکەت تەواو کرد؟

شۆڕش: بەڵێ تەواو!.. بانگم کردووە بێت بۆ ئێرە، ئیتر وەختیەتی.. ئەوە تۆش هاتی باشتر.. با ئاگادار بی چۆن ئەیشکێنم.

سەردار: نا شۆڕش ئەگەر هات من ئەڕۆم، با هیچ قسەیەکتان لەبەرچاوی منا نەبێ.. دنیا لە هەرزن وردترە برا، کێ ئەڵێ ئیشێکمان تێی ناکەوێ؟ بیری دوو بەیانیت هەبێ.

شۆڕش (( کەمیک بیر کردنەوە)): ڕاستە..... ئەوە ڕاستە ...... وایە گەر لەبەرچاوی تۆ بیشکێنم، ڕەنگە وابزانێ دەستی تۆشی تیایە، با ڕق هەڵنەگرێ.

سەردار: من پرسیارم کردن، بە راستی زۆر دەوڵەمەندن و خێزانێکی ئاسانیش نیین.. وەک ئەشزانی باوکیان پیاوکوژێکی سەرشێت بوو، نەک کوڕێکیشیان دابێتییەوە سەر ئەو، ئیتر بۆ ئەمە ئەکەی؟

(( ئاوا دێتە ژوورەوەو سەلام و وەڵام و بەخێرهاتن و ئیزن خواستنی سەردار و چوونە دەرەوەی))

ئاوا: فەرموو ئەمرکە قوربان!

شۆڕش(( لە زەرفێکا پارەیەک بە دۆلار دەرئەهێنێت)): ئەمە پارەکەت کاکە ئاوا ماڵت ئاوا بێ.

ئاوا: کام پارەیە؟

شۆڕش: خۆت نەبان مەکە چاوەکەم، ئەی خستبوتە سەر پارەکەی من و دابووتەوە بە گێلاسی خوشکم.. بەڵام پێم بڵێ ئەوەت بۆ کرد؟

ئاوا: تۆ جارێ پارەکە هەڵگرەوەو پێش ڕۆشتنم بمدەرەوە با کەسێک نەیبینێ بەدەستتەوە، چونکە تا نەڕۆم، لێت وەرناگرم.

شۆڕش: بەڵام هەر ئەبێ وەریگریتەوە.. دڵنیابە پارە لە کەسێک وەرناگرم لە پەنا دۆستایەتییەوە چاو ببڕێتە شەرەف و ناموسم.. ئەوە من نیم کاکە، بڕۆ بەدوای پیاوێکی وایا بگەڕێ.

ئاوا: من ئەزانم چاکە کاتێ ئەکرێ، کە داوا بکرێ، ئەگینا وەک ئەمەی بەڕێزت بە خراپە ئەشکێتەوە، بەڵام.....

شۆڕش: خراپ شکانەوەی چی هەتیو؟ تۆ لەبەرچاوی خۆم شەرم و شکۆت نەکرد، شەوەکە خەریک بوو ئەچوویتە ناو چاو کچەکەمەوە.. ئەزانی هەر بەڕاست ئەوەندەی نەمابوو هەستم بەر شەقتبەم؟

______ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut ______________

دیمەنی – ٥٩٤ – ڕ/ ن – ماڵی بروسک:

(( لەسەر نانخواردنی ئاسایی، بروسک و ڕێژوان و چیمەن))

چیمەن: عەمری کاردۆ نەمێنێ یاخوا، کەی لە برا چووە تا ئێستا نارەحەت بێ بۆ مەرگی دایکی؟ ئەو کوڕە لە خۆپەرستیا بەشی کەسی نەهێشتۆتەوە.

بروسک: بەداخەوە! ڕاستە قسەی تۆیە، لەوەتای هاوسەرگیریشمان کردووە، جارێک لە ماڵی خۆمان نەمبینیوە.

چیمەن: گوایە ئێستا لە ئەوروپایەو ناتونێ بگەڕێتەوە هیچی بۆ نەکراوە، بەس بۆی کرا ژنەکەشی بگەیەنێتە ئەوێ.

ڕێژوان: من ترسی ئەوەم هەیە چەند ساڵێکیتر کە تێلی بۆ بکەین، بلێ ئێوە کێن؟

چیمەن: با بڕوا هیچ و پووچی بێرەحمە.

ڕێژوان: کچێ وازی لێ بێنە، هەرکاتێ خۆت وتت کەی برای ئێمە بووە؟ خوا ئەکا هەواڵی ئەو لێبوردنە گشتییە بە ڕاست ئەگەڕێ، هیچمان ناوێ.. کوا باوکم ئەیهێشت ئاوا هیلاک بین.

بروسک: وەڵا دەنگۆی گەرمە ڕێژوان، ئاگادری هەواڵ بین باشە، هاکا ڕۆژێ ڕایانگەیاند.

چیمەن: ئۆهـ خوایە نەزرو ئەهدم قبوڵکەی!.. (( کەمێک بێدەنگیی)) دەی ڕێژوان گیان بروسک گیان خێرا نانەکەتان بخۆن، با ئەو کچەش بێتەوە پاروویەک بخوا، خوا ئەزانێ چەندی برسییە ئێستا.

ڕێژوان (( دوا پارووی بە دەمەوەیە، بەدەم خواردنییەوە هەڵئەسێ و بروسکیش بەدوایا)): وا من ئەڕۆم بروسک، دواییش هەر خۆت بیهێنەرەوە.

بروسک: ئێ باش.

چیمەن: کورە وامنەوت بیرت کەوتەوەو ئاگری جگەر هەڵیگرتی، تا چاکەت ئەخۆی بروسکیش تەواو ئەبێ.

ڕێژوان: نا لای محەل چای لێیە، گوناحە، دەی خواحافیز.

بروسک: بوەستە وا هاتم.

(( چیمەن خواحافیزیی و خەریکی نانخواردنن))

Cut

دیمەنی – ٥٩٥ – ڕ/ ن – ژووری سەرکۆ:

سەرکۆ: نا، ئاسایشی خەڵک گرنگترە.

ڕاهۆز: گەورەم مەبەستم ئەوەیە، ئەم بەناو پاشایە وا پیاوەکانی خۆی چاوترسێن کردووە، کەسیان ناوێرن لە پێستی خۆشیانا بجوڵێنەوە؟.

سەرکۆ: تێئەگەم، بەڵام ئەم ئیشە دەستوبردی ئەوێ، ئەم کابرایە بەربۆتە ئەم خەڵکە دەمێ کوشتن و دەمێ دزیی و دەمێک چەتەیی و سەرانەو جا هیچی تیا هێشتۆتەوە؟

ڕاهۆز: گەورەم ئەم تۆڕە فراوانترەو سوودیشیان لە هەڵەکانی دارەوان وەرگرتووەو وردەکاریی زۆرتر ئەکەن بۆ خۆ شاردنەوەیان.. لە هەموو ئەو وێستگانەی کە ئەبێ تیایا ببینرێن چاودێریی توندم داناوە.

سەرکۆ: چیت دەسکەوتووە تا ئێستا؟

ڕاهۆز: ژمارەی سەیارەیەک کە هاتوچۆشم لێ ئاگادار کردووەتەوە، بەڵام دەست نەکەوتووە.. چاودێریی توند لەسەر شاموراد.. براکەی زایەرو هاوڕێکانی خەریکە بێ ئومێد ئەبن.. لێپرسینەوە لە ماتۆڕسوارەکان.

سەرکۆ: سستە نەقیب ڕاهۆز.. ئەوان جوڵەیان زۆرەو ئێمەش هیچێکی ئەوتۆمان دەست نەکەوتووە، تەنها ژمارەی سەیارەکە گرنگە، گەر ئەویشیان نەسوتاندبێ، یان ژمارەی ساختەیان لێ نەبەستبێ.

ڕاهۆز: گەورەم هەوڵی زۆر خێراتریش ئەدەم، بێخەمبە ناهێڵم زۆر بخایەنێت..

سەرکۆ: ئا ئەو نەخشانەم بدەرێ.. با لە کۆی دزیی لێکراوەکان و نزیکایەتییان لە یەکەوە وردبینەوە، ڕەنگە بگەینە خاڵێکیتر.

(( لە میوتیدا ڕاهۆز نەخشەکان لەسەر مێزەکەی سەرکۆ ئەکاتەوەو تەماشای ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٥٩٦ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٥٩٣ – ئۆفیسی شۆڕش:

ئاوا (( خەندە )): ئینجا شەقی تۆ پاشەڵم پیرۆز ئەکا.. ئێستاش ئەتوانی ئەوە بکەی.. (( شۆڕش سەردائەخات و بێدەنگ )) دەی.. دەی بۆم هەستەو پڕ شەقمکە با مەراقەکەی لەسەر دڵت نەمێنێ.

شۆڕش (( تورە )): بەر شەقت نادەم.. تەمێت ئەکەم.. کەس بەقەدەر من دڵی گەورە نییە، نەکەی ئەوە لەگەڵ هیچ کەسێکا دووبارە بکەیتەوە، ئەگینا سەریشت دائەنێی.

ئاوا: ببورە بڵێم بە هەڵە تێگەیشتنێک هەیە.. باسی کچەکە بخەرە لایەک و ئێستا با باسی ئەوەت بۆ بکەم بۆچی ئەو پارەیەم خستە سەر پارەکەت.

شۆڕش: بەڵێ لەبەر نینا، لەبەرئەوەی ڕۆژانە لای گێلاس ئەیبینی.. دڵنیابە جارێکیتر هەوڵی بینینی بدەیتەوە، لەوێ لای ئەبەم و حسابی چاکیشت لەگەڵ ئەکەم.

ئاوا: وا نابێ کاک شۆڕش، ناکرێ من هەرچییەک بڵێم و تۆ بیبەیتەوە سەر باسی کچەکەت.

شۆڕش: ئاخر باش نیەتت ئەخوێنمەوە.

ئاوا: ئەی ئەگەر کەسێک بۆ نینا بێتە پێشەوە چی ئەکەی؟ وەڵا ڕەنگە بیکوژی؟!

شۆڕش: نا ئەگەر بە پیاوانەو مەردانە بێتە پێشەوە، هیچ گرفتم نییە، نەک وەک جەنابی ناموبارەکت شەللاتیانە چاوی تێ ببڕێ.

ئاوا: دە کەواتە منیش مەردانە دێمە پێشەوەو تۆش ئەو شەرەفەم پێ ڕەوا ببینە.

شۆڕش (( گرژ )): هەتیو تۆ ئاگات لە خۆتە لە بەردەمی منا ئەڵێی چی؟

ئاوا: ئەی تۆ نەتوت گرفتم نییە، ئەگەر نیازی خراپ نەبێ؟

شۆڕش: با، بەس تۆ نا.. تۆ زۆر خراپ هاتییە پێشەوە.

ئاوا (( خەندە )): دوو ڕۆژیتر ئەوەت بیر ئەچێتەوە گەورەم.. ئێستا وتت چی؟

شۆڕش: هەتیو توشی حاڵەتێکی سەیرت کردم.. نازانم بڵێم چی؟

ئاوا: ئەگەر کچەکە، هەر ڕێگیرییەک بکا، بەڵێنت ئەدەمێ نەک بەلای ئوتێلەکەیا ناچم، نەخێر، ئیتر هەر سەیری دەرگای ماڵی گێلاس خانیش ناکەم کە بەرامبەرن.

شۆڕش: ئەی ئەگەر من ڕێگیریی بکەم؟

ئاوا: باوەڕ ناکەم کەسێکی شارنشین، ببێتە کۆسپ لەبەردەمی ئایندەی کچەکەی خۆیا.

شۆڕش: کەواتە بەو زمانە لوسەت، کچەکەشت لە خشتە بردووە؟

شۆڕش: نەخێر بە هیچ جۆرێک هیچ شتێکم لەگەڵا باس نەکردووە.. ئوسوڵ ئەزانم و ئەمەم پێ جوانترە کاک شۆڕش.

شۆڕش: بەو هیوایەم وابێ، گەر دڵنیابوومەوە وایە، پشتگیریشت ئەکەم نەک ڕێت لێ بگرم.. بەڵام لەوەشدا ڕای کچەکە لە پێش ڕای هەموومانەوەیە.

ئاوا: من قبوڵمە.. هەرچەند دڵنیاش نیم لە ڕای ئەو.. بەڵام هیوادارم ئەویش ڕای باش بێ.

شۆڕش: هەتیوە کەڵەکچییە، قسەت پی نەهێشتم.

ئاوا(( هەڵئەسێ)): بەو هیوایەی وەڵامی پۆزەتیف لە گێلاس خان وەربگرمەوە، ئێوەش بە دڵی خۆتان ڕاوێژو وتووێژی خۆتان بکەن.. ئەگەر ئەمرێکت نییە، من ئەڕۆم.

شۆڕش(( لە جێی خۆی دانیشتووە)): تۆ بڕۆ، خواحافیزت بێ (( خواحافیزیی ئاواو ڕۆشتنی.. پاش کەمێک)) هەتیو وەرە پارەکەت!!!!

Cut

دیمەنی – ٥٩٧ – ڕ/ دەمەوئێوارە – بەردەرگای ماڵی حەمەتایەر:

Mute

(( تایەرو برزو لە ماڵی تایەر دێنە دەرەوەو بەرەو چاخانەی گەڕەک ئەچن))

—— تابع —— Cut ——

دیمەنی – ٥٩٨ – متبوع – ش / د - سەری کۆڵانێک:

(( تایەرو برزو لە سەری کۆڵانێک لە خوار ماڵی خۆیانەوە دەرئەکەون.. نەجاتی ماتۆڕسوار دێتە نزیکیانەوەو دەمانچە دەرئەهێنێ، تایەر دەست ئەبا بۆ بەر کەمەری و برزو دەمانچە دەرئەهێنێ))

# (( ئەڵقەی بیست و نۆ))

(( ماتۆڕسوار کە ئەبینێ تایەر دەست بۆ کەمەری ئەباو برزوش هەروا.. یەک دوو فیشەک بە عەشوائی ئەتەقێنێ و بە خێرایی زۆر دەرئەچێ، تایەر دەمانچەی پێ نییە، برزو لە دواوە تەقەی لێ ئەکات، بەڵام ماتۆڕسوار زیک زاکی ئەڕواو دەرباز ئەبێ))

تایەر: هیچت بەرنەکەوت برزو؟

برزو: نا من سەلامەتم ئەی تۆ؟

تایەر(( شڵەژاو)): کورە لە هەموو ڕۆژێکا منیش ئەمڕۆ دەمانچەم نەهێنا، وتم با باوکم هەست بە هیچ نەکا.. هەروا دەستم کرد بە کەمەرما، وتم با وابزانێ پێمە.

برزو(( هەناسەبڕکێ)): بەقەبری باوکم لەوەش ترسا دەستت برد بۆ کەمەرت.. هەر زۆر خوێڕی بوو، بینیت چۆن دەرچوو.

تایەر: بەساقەوبم برزو گیان، وەڵا تۆ نەبوویتایە ساردی ئەکردمەوە.

برزو: بەخوا ئیتر بە دەقە جێت ناهێڵم، ئەو پاشا خوێڕییەیان ئەیەوێ لەناوت ببا حەمە تایەر، ئەزانێ ئێمە بەدوایەوەین.

تایەر: با بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەو دەمانچەکە بێنین، نەک بگەڕێتەوە.

برزو: نا پیاوی گەڕانەوە نییە، ئەگەر بگەڕایەتەوە ڕای نەئەکرد.

تایەر: کورە ئێستا باوکیشم دڵی لامانە، هەر ئەچین دڵنیای ئەکەینەوەو لەوێشەوە دەمانچەکە ئەهێنم.

برزو: دەی باشە، لەبەر باوکت با بڕۆین.

(( شەماڵ و هاکارو ئاکارو گەر بکرێ چەند گەنجێکیتر، دیارن لە دوورەوە بە ڕاکردن بەرەو لایان دێن و بانگیان ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٥٩٩ – ش/د – باخی ماڵی شۆڕش:

(( شۆڕش و نینا دانیشتوون.. نینا شەرم و سەری دانەواندووە))

نینا: باوکە ئەترسم.. ناتوانم بڕیار بدەم.

شۆڕش: دەی کەوایە بە پورە گێلاست بڵێ، ئاگاداری بکاتەوە، کە تۆ ڕازیی نیت.

نینا: نا باوکە جارێ زووە، ئێستا بیرکردنەوە ماندووی کردووم، خۆی کەسێکی باش دیارە، نامەوێ بەهۆی باری دەروونیی شڵەژاومەوە خێرا بڕیار بدەم و دواتر ڕەنگە قەت نەگەمەوە بە کەسێکی وەک ئاوا.. ئەمەوێ بە ئەقڵ بڕیار بدەم.. ڕاستیەکەی من خۆیم زیاتر لا مەبەستە.

شۆڕش: ئەی چی ڕایگرتووی کەوابێ؟ هەر ترسەکەت؟ ترس لە چی کچم؟

نینا: باوکە پورە گێلاس ئەڵێ دایکیان پەیوەندیی بە هیچی باوکیشیانەوە نەبووەو کوڕو کچەکانیشی کەسیان نەیانزانیوە باوکیان خەریکی ئەو بەزمانەیە، کەچی تەقە لە دایکیان کراوەو دزیش لەبەر دەرگایان کوژراوە.. ئەترسم هەرکەس بچێتە ئەو خێزانەوە، تەقەی لێ بکرێ.

شۆڕش (( بە پەنجە چەناگەی نینا ئەگرێت و سەری بەرز ئەکاتەوە)): بۆ وا سەرت ژەنیوەتە ئەرزەکە کچم، خۆ شتی خراپت نەکردووە؟.. ئەمە لە داواکردنێک زیاتر نییە، ئەتوانی ڕازی بیت و ئەتوانی ڕەتی کەیتەوە، سەر دامەخە پێم خۆش نییە (( ڕۆڤانی کوڕ، تەمەنی ٢٠ساڵێک نزیک ئەبێتەوەو لە ئەی ثرییەکدا ڕەسمی کردوون)) وەک وتم جارێ با کەس نەزانێ و بە هێمنیی بۆ خۆت بیری لێ بکەرەوە (( بۆ ڕۆڤان)) ئادەی بزانم کوڕی بابەی چی بۆ کێشاوین؟

ڕۆڤان: لە پەنجەرەکەوە سەیرم ئەکردن و ئەمەم کێشا.

نینا(( سەرسام)): واو بەو خێراییە؟

ڕۆڤان: ئەی برات هەروا نەبووە؟ ئەی ئەو شەوەی ژیلەی هاوڕێت هات، خۆ بە دیارتانەوە دانەنیشتم، هەر سەرنجێکی وردداو پۆرترێتەکەیشت بینی؟

نینا: ئاخر ساختەچی ژیلە جوان بوو بۆیە خێرا ڕەسمیت کرد.

ڕۆڤان: ئەی وایە چۆن خۆم بە ناشرینەوە ماندوو ئەکەم.. هەرچەند ئەتوانی لە ناشرینیشدا جوانی ببینیتەوە.

شۆڕش: لە ناشرینیدا جوانیی هەیە؟

ڕۆڤان: ئەی چۆن باوکە؟ مالارمێی شاعیر، فەرەنسییەکە ڕای وایە ناشرینیی لە فۆرمی شتەکاندا جوانیی هونەریی ئەخوڵقێنێ.

نینا: نا نا باشیت، دیارە لە پەیمانگە هەر وانەی شێوەکاریتان نییە، شیعریش ئەخوێنن؟

ڕۆڤان: نا نینا گیان، ئەوانە کتێبیترن ئەیخوێنمەوە.

شۆڕش (( بەگاڵتەوە ئەکێشێ بە پشتەملیا )): ئەمە بۆیە وا ئەخزێیتە ئەو ژوورەوە.

ڕۆڤان: ئەی بێسوود خەریکی خوێندنەوەم باوکە بڵێم چی؟ خۆزگە منیش وەک زۆرێک حەزم لە حیلکە حیلکی سەرشانۆو ڕۆشنبیرییە عەوامخۆرەکە بووایە.

نینا: ئیتر هەرکەسەو بە ئەقڵیەتی خۆی ژیان بەڕێ ئەکا باوانم، گوێی مەدەرێ.

(( هەندێ دایالۆگیتر و چوونە ژوورەوەی باوکیان ))

Cut

دیمەنی – ٦٠٠ –ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( سەلواو تافان و باڵاو کلێپە هەن))

تافان: ئینجا وەکو بزانی پێویستیان بە کارمەند نییە؟

سەلوا: نەبەخوا پرسیاریشم بۆ کردی.

تافان: نا بۆ خۆمم نییە سەلوا گیان، تازە من بەدەست مناڵەوە بووم بە پیرێژنی ماڵ.. باوەڕ بکە هەموو ژیانم لەدوای مناڵەکانەوە، ئەو ماوە کورتە بوو لە کۆمپانیاکە بووم، ئەزانی چەند دڵخۆش بووم؟

سەلوا: دەی ئەوەتا منیش بەدەست ئیشەوە گیرم خواردووە، ئەگینا مناڵەکانم ئەگرتە خۆ.

تافان: هەر لێیگەڕێ تافان گیان، دڵم بە هیچ شتێک خۆش نەماوە.

سەلوا: نا نا وامەڵێ، ئەها ئەو منالانە چەند ماڵیان بۆ جوان کردوون؟ ئەی ئێمە بڵێین چی؟

تافان: بۆ سەلوا سەردانی پزیشکتان کرد؟

سەلوا: ئەی چۆن تافان گیان؟

تافان: لە کامتانەوەیە؟

باڵا: ئەرێ دە توخوا وەرە فێری ناوی پەنجەکانم بکە.. هەر قسە ئەکەن قسە ئەکەن.

سەلوا: باشە باوانم وا هاتم (( بۆ تافان)) بافێریکەم و دوایی دێمەوە.

سەلوا (( ئەچێتە لای باڵاو کلێپەوە، بە پێی پەنجەکان ئەیلێ)): ئەمە توتە (( ئەوان ئەیلێنەوە تا کۆتایی)) برای توتە، زەڕنەقووتە، دۆشاومژە، ئەسپێ کوژە(( ئەوانیش هەمووی ئەلێنەوەو بەردەوام ئەبن.))

Cut

دیمەنی – ٦٠١ – ش/ د – بەردەمی عیادەی دکتۆرێک:

(( حەسەن هاوتەمەنی نەجات.. لەگەڵ نەجات لە بەردەمی عیادەی دکتۆرێک وەستاون، کە دوا نەفەر لە ژوورەوەیەو دێتە دەرەوە.. سکرتێرەکە شتەکان کۆ ئەکاتەوەو ئەیەوێ بچێتە ژوورەوە.. نەجات کە باڵی بە پەڕۆیەک پێچراوەو خوێنی پێوەیە، هێرش ئەکاتە سەر سکرتێرە کچەکەو حەسەنیش ئەچێتە ژوورەوە بۆ دکتۆرەکە))

نەجات: دەنگت لێوە نەیەت مەترسن هیچتان لێ ناکەین.

سکرتێرەکە (( کە نەجات دەمی گرتووە، بەسەر ئەمازەی باش ئەکات، نەجات دەمی بەرئەدات)) بەسەرچاو.. فەرموو ئەوە هەموو پارەکانە.

نەجات: پارەم ناوێ، پێشمکەوە بۆ ژوورەوە.

(( سکرتێرە لە پێشەوەو نەجات بەدوایدا ئەچنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٠٢ – ش/د – باخ و حەوشەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و خدر وەک خۆی دانیشتوون.. کتێبێک بۆ خوێندنەوە هەڵەوگەڕاوە ))

نارەوەن (( پێکەنین )): دە ئاوا بڵێ کوڕم، شتیشم لێ ئەشاریتەوە؟

خدر: نا ئەوە ئیشی نەقیب ڕاهۆزەو ئەبێ زۆر بە خێرایی بکرێ.. ئەگەر بیوتایە با ئەویشت لەگەڵ بێ، هەر یەکەم دەقە پێم ئەوتی.. ئەشزانێ من و تۆش هیچی شاراوەمان نییە، نەیوت بەو مەڵێ.

نارەوەن: یاخوا سەرکەوتووبی، وریابە خۆت لە مەترسیی نەدەی.

خدر: خۆ ئەوە بەدەست خۆمان نییە، ئەگەر بەرژەوەندی خەڵکانێک ئەوە بخوازێ، ئەبێ ئەوەش بکەین.. ئەوە کارە مرۆڤدۆستییەکەمانە.

(( تیرۆژ بە جلێکی زۆر جوانی هاوینەو کەمێ ماکیاژەوە دێت و بە پێکەنینەوە ))

تیرۆژ: کارە مرڤۆدۆستییەکەتان کامەیە؟ سەرخڕ.

نارەوەن (( مۆڕە )): تیرۆژ!!!!!

خدر: لێیگەڕێ، ئاساییە نارەخان!

تیرۆژ: دایکە ئەوە بۆ ئەوەنە دواکەوتووی؟ ئێمە هاوڕێین! سوعبەتیش ئەکەین و قسەی خۆش و هەموو شتێ.. خۆ منداڵ نیین مۆڕەمان لێ بکەی؟

خدر (( پێکەنین )): منی تێ مەکە، هەر مۆڕەی لە تۆ کردووە. هههە.

نارەوەن: دەی باشە خدر گیان، سوپاس بۆ سەردانەکەت، لە سەفەرەکەتا زۆرت پێ ئەچێ؟

تیرۆژ: واو ئەچی بۆ سەفەر؟ کە ناخۆشە.. یەعنی ئیتر وا زوو ناتبینینەوە؟

خدر (( متحیرەو هەڵئەسێ )): ڕاستیەکەی نازانم چەندم پێ ئەچێ، ئیتر بە پێی پێویست.

تیرۆژ: باشە دەنگت هەبێ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر، تیرۆژ بە گەرمیی))

نارەوەن: ئەرێ ئەوە بۆ وات لێهاتووە مردووت مرێ؟ عەیب ناکەی؟ شورەیی ناکەی؟ تۆ کچی کچ، ئەم خۆبردنە پێشەوەیەت لە چی کچێ؟

تیرۆژ: چییە دایکە خەریکە پیاو بینینم لێ قەدەغە ئەکەی؟ چیمکردووە؟

نارەوەن: با نەیەم دەموفلْقت بکوتمەوە بێدەنگ بە.. ئەی ئەم جل و ماکیاژەت لە چی؟

تیرۆژ: جلەکانم چییەتی دایکە تۆ بۆ وا ئەکەی؟ مایکەپیشم هەر کردووە، بۆ ئێستا وا لێت بووە بە کێشە؟

نارەوەن: ئاخر کچی نازانم چییەکە، تۆزێ پێش ئێستا هیچت پێوە نەبوو، خدر وەک براتان وایە، بۆ خدر ماکیاژ ئەکەی؟

تیرۆژ: میوان هەر میوانە.

نارەوەن: زەهری مار، بچۆ ژوورەوەو فزەت لێوە نەیەت، ئەگینا بە ئامۆو ئاواش ئەڵێم.

(( تیرۆژ بە تووڕەیی و بێزارییەوە، پێ ئەدا بە ئەرزاو نارەزایی دەرئەبڕێ و ئەچێتە ژوورەوە))

نارەوەن (( تورە)): وەڵا بابە هەر لەمەمان کەم بوو!!!

Cut

دیمەنی – ٦٠٣ – ش/د – باخی ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆ لە باخەکەدا دانیشتووە میوە ئەخوا))

(( پاش سڵاو و بەخێر هاتنەوە))

گێلاس : واییی مردم!

ئاکۆ: ئەوە خێر؟ بۆ وا درەنگ هاتیەوە، تۆ دایمە لەگەڵ بانگی عەسرا لە ماڵی!

گێلاس: تا پارەم کۆکردەوەو ژماردم و ئینجا نینام گەیاندەوە ماڵەوەلەوێش پێمچوو.

ئاکۆ: دەی خوا نەیبڕێ گەیشتیە پارە کۆکردنەوە؟

گێلاس: کورە ئاگات لەچییە ئاکۆ؟ ئەوە سەری دووەمجارە پارە ئەهێنمەوە، بێ چاوێنیی بێ، میوان زۆرە، بەڵام چونکە خواردنەکەمان باشە، لە دەریشەوە خەڵک دێت بۆ ڕێستورانتەکە،

ئاکۆ: گەیشتوویتەوە بەوەی هەتبوو؟

گێلاس: نا جارێ بەس پارەی ڕیکلامەکە هاتۆتەوە شوێنی خۆی.. وا بڕوا زۆر باشتر ئەبین.

ئاکۆ: ئەوەش باشە، بەڵکو زوو دەست بکەیت بەوەی ئەولا.

گێلاس: لە سەد شوێنی تریش ئوتێل دابنێم، دەست لەمە هەڵناگرم.. ئیتر کاتی کرێدانانەو دوای ئەوە حسابات ئەکەم.

ئاکۆ: ئەی ئیشی نینا باشە؟

گێلاس: هەر گوڵە گوڵ، بە هەموو شتێکەوە خۆی ماندوو ئەکا

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٦٠٤ – ش/ن – ژووری پاشا:

(( نەجات باڵی پێچراوە و پاشاش بە دەمامکەوە، نەجات بە پێوەو پاشا دانیشتووە، پشتە سەری دیارە، یان لایەکی))

نەجات: پاشا گیان لەگەڵ حەسەن چووینە سەر دکتۆرێک و بە زۆرەملێ زوو گوللەکەی دەرکرد.

پاشا: ئەی کەس نەیبینیت بەو خوێنەوە؟

نەجات: نا پاشا گیان، شەو بوو دکتۆریش لە ڕۆشتنەوەدا بوو، هەر خۆی و سکرتێرەکەی مابوونەوە، ئێمەش دەمامکمان بەستبوو.

پاشا: ئەی نەتتوانی هەر هیچ نەبێ براکەی بکوژی؟

نەجات: پاشا گیان لەوەیا نەبوون، هەر من دەستم برد بۆ دەمانچەو ئەوان پێش من تەقاندیان و یەکەم فیشەکیان بەر باڵم کەوت.. لەدواوە هەزار فیشەکیان پێوەنام، زۆر بە زەحمەت دەرچووم.

پاشا: تازە ئەو کوڕە بە تۆ ناکوژرێ نەجات، با بزانم چۆن یەکێکیتر ڕاسپێرین.

نەجات: مەگەر حەسەن؟

پاشا: نا تازە ئەوان وریا بوونەتەوە، یەکێک ئەنێرین گەر بشکوژرێ کێشەمان نەبێت و خۆمان نەکەین بە خاوەنی.

نەجات: هەرچی بە من ئەمرەکەی پاشای گەورە لە خزمەتدام.. میرم فەرمانی پێکردووم لە خزمەتی جەنابتا بم.. ئەی کێت لە خەیاڵە پاشا؟

پاشا: با بزانین چۆن ئەبێ، ئەوەی لای شامورادم لە خەیاڵە.

نەجات: ئەی پاشا گیان، نۆکاوفرۆشەکەی بەردەمی سەر بەخۆمان نییە؟

پاشا: نا جارێ نازانین کێیەو لە کوێوە هاتووە.. بە دوایکەوین و هەموو شتێکی لەبارەوە بزانین.

Cut

دیمەنی – ٦٠٥ – ش/ن –ماڵی خدر لە قەراغی شار:

(( ماڵێکی وێران، یەک ژووری گڵ و پەرژینی بە تەنەکە، ماڵێکی هاوشێوە دراوسێیەتی.. خدر٣ بە پێ عەرەبانەکەی ئەهێنێتەوە، دوو مەنجەڵی گەورەی گەورەی لەسەرە.. عەرەبانەکە ئەباتە ناو حەوشەکەیەوە.. عیرفانی تەمەن نزیکەی ٣٥ساڵ دێت))

عیرفان: بەخێر بێیتەوە کاک سمکۆ.

خدر٣: سوپاس عیرفان گیان، بەڵام خێری چی ئاوی پێم داهات ئەوەندە بە پێ هاتووم.

عیرفان: ماوەیەکیتر ئەوەندە ڕادێیت هەموو ڕێگاکان کورت کورت ئەبنەوە هههە.

خدر٣: بڵێ پێستی بنی پێت ئەوەندە ئەستوور ئەبێ، ئیتر بەخۆت نازانی و پێڵاویشت ناوێ.

عیرفان: دەمخۆش.. ڕێک وەک ئێمەت لێدێت.

خدر٣: وایە، ئیش ئەوەشی ئەوێ.

عیرفان: با مەنجەڵەکان ببەمەوە بۆ ئامین، مشوری بەیانیت بخوا.

خدر٣: دەی دەستی خۆش بێ و لەشی ساغ بێ.. منیش بچم بخەوم، بەخوا بەپێوە خۆم بۆ ناگیرێ.

عیرفان(( بەدەم هەڵگرتنی مەنجەڵەکانەوە)): دەی خوا فرسەتت با، فەرموو بچۆ ئیسراحەتکە برا.

(( عیرفان مەنجەڵەکان ئەبا بۆ ئەو دیو و خدر ئەچێتە ژوورەوەو دەرگا توند دائەخا))

Cut

دیمەنی – ٦٠٦ – ڕ– بەیانی/ د – بەردەمی ماڵی هەڵشۆ:

Mute

((شەبەقیی بەیانییە، کەمێک تاریکیی ماوە.. سەیارەیەکی بەرز هەڵشۆ لەبەر دەرگا دائەگرێت و هەڵشۆ بە کلیل دەرەوە دەرەگای ئەکاتەوەو دواتریش دەرگای مەدخەل و ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٠٧ – ڕ/ن – ماڵی نارەوەن:

(( ئاوا قاتی لەبەر کردووەو شیک خۆی گۆڕیوەو بۆن لە خۆی ئەدات، ئامۆ بە چاکەت و بیجامەوە دێتە لای خەواڵووە))

ئاوا: تۆش هەڵسای؟

ئامۆ: جا تۆ ئەهێڵی کەس بخەوێ؟ بە تەق و هوڕی تۆ خەبەرم بووەوە ئەوە خەریکی چی بووی؟

ئاوا: کوا چیمکردووە؟ پێڵاوم بۆیاخ ئەکردو کارەباش هەبوو ئوتویەکی ئەو کراسەم کرد.

ئامۆ: ئەک ماڵەکەی نینا ئاوا بێ، ئەها هەر لە ئێستەوە چیت پێ ئەکا؟

ئاوا(( بەدەم ڕۆشتنەوە)): جا جارێ لە کوێیەمە؟ هههە.

ئامۆ: دەبڕۆ خواردنەکانیان ئامادە کە، با سزات نەدا هههە.

(( ئامۆ بەرەو دەموچاو شتن ئەچێ))

Cut

دیمەنی – ٦٠٨ – ڕ/ن – زیندان:

(( زوبێر ساڵۆنێک گسک ئەدا، جلی زیندانیی لەبەردایە))

<u>زوبێر مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

تەواو.. هەموو شتەکان تەواو.. ئیرادە زۆر کۆسپی گەورە ئەبەزێنێ.. ئەمشەوم لە هەموو شەوەکان درێژتر بوو.. هههه وام ئەزانی جارێکیتر خۆر هەڵنایەتەوە.. بیرم لای مواجەهەکەی ئەمڕۆ بوو.. ئەمشەویش هەروائەبێ، کە ئەیانبینم ئاگرم تێبەرئەدەن.. تۆ بڵێی چەند جاریتریش وابێ؟ ههه ئای زوبێر چیت نەدی لە ژیانا؟ ئەبووایە پێشبینی ئەمەشم بکردایە.. ئێ من چووزانم داهاتوو چۆن ئەگوزەرێ، کێ ناڵێ خراپتریش نابینم.. ئێستا زۆر زۆر دڵخۆشم ئێرە جێ بهێڵم.. بەڵام بەرەو چی؟ هیچ شتێک لەجێی خۆیا نەماوە، ڕاهاتنی ڕۆژانەم هەموو ئەگۆڕێ.. تۆ بڵێی دوای ئەم دابڕانە چۆن بگوزەرێ؟ هههه.. زوبێر کەی ئەوەندە داماو بوویت دەرەوە توشی دڵەڕاوکێت بکا؟ شانی ئەدەمەبەرو ئەبمەوە بە زوبێر، تەنها زوبێر، کەسیتر نا..

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>:

_______________ Cut _______________

دیمەنی – ٦٠٩ – ڕ/د – نزیکی ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆ جانتایەکی دیبلۆماسی بەدەستەوە، عەینەکێکی ڕەشی لە چاودایە.. لە سەیارەکەی دائەبەزێت و بەرەو ئۆفیس ئەچێ.. شەنیا بەرامبەری دێت و بێ پەرواو بە کراوەیی سڵاو ئەکا ))

شەنیا (( ئەیەوێ بوەستێ )): سڵاو مامۆستا؟

ئامۆ (( ناوەستێ و بەدەم ڕێوە )): بژیت دادە گیان.

شەنیا (( لەپشتیەوە وەستاوە )): چییە بەم بەیانییە زووە سەرو دڵیان گرتووی؟ وا لەژێر لێوەوە وەڵام ئەدەیتەوە؟

ئامۆ (( ئاوڕ ئەداتەوە )): بەڵێ؟

شەنیا: ئەوە چییە ئەوەنە گرژو مۆنی؟ سڵاوم کرد سڵاو، نابێ جوان جوابم بدەیتەوە؟ یان خۆت هەڵە ئەکەیت و وا نیشان ئەدەی نامناسیتەوە.

ئامۆ (( عەینەکەکەی دائەگرێ )): ئۆو ببوورە کچەکەی دوێنێی؟ ببورە نەمناسیتەوە (( دێتەوە نزیکی )) سڵاو خانم گیان.

شەنیا: باش بوو عەینەکت داگرت و شێوەت ناسیمەوە.. بەڵام تا ئێستاش وا نیشان ئەدەی ناوەکەمت بیرچۆتەوە.. من خانم نیم با بزانی (( بە دەنگی بەرزتر بەگوێیا )) شەنیام شەنیا.

ئامۆ: باشە باش تێگەیشتم، شەنیاخان، ببورە.. بەیانیت باش!

شەنیا: بەیانی خۆت باش.. ئەوە زەحمەت نەبێ لە ماڵیتەوە هەروا لوتبەرزی؟

ئامۆ (( بە تەوازوعەوە )): نا نا ببورە شەنیاخان، لوتبەرزیی چی قوربان، تەنها ئەوە بوو چاوەڕوانم نەئەکردی جارێکیتر بتبینمەوەو هیچیتر.. ئەوە خێرە لەم دەوروبەرەی؟

شەنیا: ئەمە ڕێگەی هاتوچوونمە چەند ساڵێکەو جەنابت، نائاشنای پێم.. ناهەقیشت نییە، خۆ تەماشای خەڵک ناکەی بەڕێدا ئەڕۆی (( لوتی ئامۆ ئەگرێ)) ئا ئەم لوتەت دایمە بە ئاسمانەوەیە.

ئامۆ(( بێزار)): ئەوە چی ئەکەی کچێ؟ بۆ حەیام نابەی لەم سەرجادەیە؟ بە چ حەقێ وا ئەکەی؟ ئەتناسم؟ ئەمناسی (( ئەیەوێ بڕوا ))

شەنیا: بوەستە بە لوتبەرزیی حەیات ناچێ؟ بە لووتگرتن حەیات ئەچێ؟

ئامۆ: چیت ئەوێ لە من؟

شەنیا: من وامزانی بووین بە هاوڕێ، کەچی دەعوەتی چایەکی ئۆفیسەکەت نەکردم.. چش هەر مەیکە.

ئامۆ: من هاوڕێی کچم نییە ببوورە.

شەنیا: بۆ؟ لە چ ئەشکەوتا ئەژیت وا لە کچ ئەترسی؟

ئامۆ: ئۆوووو تۆ زۆرت پێیەو کەمی دەرئەخەیت (( ئەڕوا بۆ ئۆفیس و شەنیا بەدوایا ))

شەنیا: هێی لووتبەرز بوەستە.. کورە بوەستە!

ئامۆ: وەرە ژوورەوە، خەڵکم لێ کۆمەکەرەوە.

(( ئامۆ ئەچێتە ژوورەوەو شەنیا بەدوایا ))

———— ربط ———— Cut ————

دیمەنی – ٦١٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( ئاوا گرژ دێتە ژوورەوە، نینا بە ڕەسمیاتەوە لەبەری هەڵئەسێ و بەخێرهاتنی ئەکاو دائەنیشێتەوە، گێلاس هەڵناسێ و ئاسایی بەخێرهاتنی ئەکا))

گێلاس: ئەوە چییە؟ ئەڵێی شەو دز پێناسەکەی لێدزیوی؟ ئەو هەموو گرژییە چییە؟ (( نینا چاوێک هەڵئەبڕێ و سەیری ئەکاو دایئەخاتەوە))

ئاوا: نا کەمێک نەساغم گێلاس خان، هیچ نییە.. (( دووبارە نینا چاوی بۆ بەرز ئەکاتەوەو دایئەخاتەوە))

گێلاس: سەلامەتییە ئیشەڵڵا.

ئاوا: دەست ماچ ئەکەم زۆر سوپاس، ئەمرکە داوات کردبووم؟

گێلاس: نازانم نینا ئیشی پێت بوو!

نینا: پورێ کوا من ئیشم پێی بوو؟ هەر بۆ ڕێستۆرانتەکە نییە؟

گێلاس: ئەی هەر ئیشی ڕێستۆرانتەکەمان پێی نییە؟ بۆ چیتر هەیە تا ئیشمان پێی بێ؟

نینا: خۆت پێێ بڵێ پورێ (( سەردائەخاتەوە)) خۆشت ئەیزانی.

گێلاس: نا ئەوە ئیشی تۆیە کچم.. یان بەعزن و قسەتان نییە پێکەوە؟! هههه

ئاوا: فەرموو گێلاس خان.

گێلاس: کەواتە دڵنیا بوومەوە کە قسەتان نییە.

نینا (( هەر سەری داخستووە)): نا پورێ گیان، ئەو نەساغەو منیش ماندووم، ئەرک بکێشی زوو بەرێیکەی.

ئاوا: دەی گێلاس خان، مادام وایە من ئیشم بە تۆ هەیە.

گێلاس: فەرموو کورِم! بچینە دەرەوە؟

ئاوا: نا عەزێت مەکێشە.. ٣ ژووری دوو نەفەریم بۆ دانێ بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ، میوانم دێت لە میسرەوە.

گێلاس: وەی بەسەرچاو ئێستا بە دیار ئەڵێم.

ئاوا: ئینجا منیش پەلەمە.. ئەبێ زوو بڕۆم گێلاس خان، زەحمەت نەبێ ئەمرکە چی بکەم؟

گێلاس: دوێنێ وا بزانم نزیکەی ١٠٠ کەسێکی دەرەکیمان هەبوو بۆ ڕێستۆرانتەکە.

نینا(( لە ژێر لێوەوە)): ٨٥ نەفەر، زۆرترینیش کەنتاکی و قۆزیی بوو.

گێلاس: دەی خۆت قسە بکە کچم، با من بەهەڵە نەیڵێم.

نینا (( هەر سەری داخستووەو سەیری وەرەقەیەک ئەکا)): خواست لەسەر قەل و کەڵەشێر نەبوو.. ١٢ نەفەر برژاوی سەفەریمان هەبوو. ٥ جێگە بەتاڵ بوو، ئەوانیتر گیرابوون.. ١١ کیلۆ گۆشت بە کاڵیی هەڵگیراوەو ماوە.. بەشی ٢٥ نەفەر شلەو برنج و ٨ قۆزیی و ٢٠ مریشک، لە مەنجەڵە هەڵمیەکانا ماوەتەوەو ئەمڕۆ تا نیوەڕۆ سوودیان لێ ئەبینین.. ٥٠ نان سارد بۆتەوەو ماوەتەوە.. خەسارەی بەیانیان تەنها دوو هێلکەی کوڵاوە.. سەوزەواتیش.......

ئاوا (( قسەی پێ ئەبڕێ)): گێلاس خان پێی بڵێ بۆ کۆمپیوتەری ناخوێنێتەوە، هیچم بۆ سەیڤ نەکرا. (( گێلاس پێ ئەکەنێ))

نینا: پورێ پێی بڵێ ئەینوسمەوەو بە ڤایبەر بۆی ئەنێرم. (( گێلاس زیاتر پێ ئەکەنێ))

ئاوا: گێلاس خان پێی بڵێ باشە سوپاس.. بەس جارێکیتر عەزێتم نەداو بە ڤایبەرەکە بینێرێ.

نینا: دە پورێ گیان پێی بڵێ کە خۆت داواتکرد (( گێلاس ئەتریقێتەوە))

ئاوا: دەی باشە گێلاس خان من ئەڕۆم.. ئەمرێکت نییە؟

نینا: پورێ پێی بڵێ، ئەگەر کەسێکی دەست ئەکەوێ ئێواران نانمان بۆ بکا، با بێت.

ئاوا: لە چەند بۆ چەند پورێ؟

نینا(( لەبەرخۆیەوە پێکەنین)): لە ٤ بۆ ٩ پورێ.

ئاوا: بەسەرچاو پورێ گیان.. خواحافیز.

(( ئاوا ئەڕوات و گێلاس و نینا پێکەنینی بەکوڵ))

گێلاس: ئێستا تێگەیشتم، ئەو هەتیوە زۆری خۆش ئەوێی.

نینا: کەیفی خۆیەتی.. شێتە ئەقڵی زۆر تەواو نییە.

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٦١١ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو ڕەمزی))

ڕەمزی: بەڵێ ڕاستە.. یەک ڕۆژ دیار نەبم پێوەی دیارە.

نیگار: جا بە هەرکەسێکی شارەزا ئەڵێی، داوای کۆڵێ پارە ئەکاو ئەویش بە هەزار ترو منەت.

ڕەمزی: وایە نیگار خان، هەموو کارگەکان شارەزاکانیان بردووە، ئەم ئیشە وردەو موچەکەشی لەچاو خۆیا کەمە.

نیگار: ئەی چارەسەر؟

ڕەمزی: بەدوای کچێکی گوێڕایەڵی باشا ئەگەڕێم، مەرج نییە شارەزاش بێ، خۆم فێری ئەکەم.

نیگار: دەی ڕەمزی گیان خۆت کەسێکی باش بدۆزەرەوە.

ڕەمزی: ئیتر من بیدۆزمەوە، یان یەکێک لە هاوڕێکانی دەوران بێ، یان خۆت کەسێکیترت بێ بە خەیاڵا؟ بەڵام من هەر بیبینم ئەزانم بەکەڵک دێت یان نا، ئاماژەیەکت بۆ ئەکەم.

نیگار: وەڵا خۆ دەوران هاوڕێی زۆرە.. ئەوە لەم ماوەیەیا، هەر دوو سێ ڕۆژێک ئەبێ، یەکێکیان هات وتی ئیشم دەستکەوتووە ئەگەر بە ڕاستی بێت.

ڕەمزی: جا ئەوە درۆی بۆچییە نیگار خان؟

نیگار: خۆم گومانی ئەوەم لادروست بوو ئیش و کار نەبێ و ئیشێکی خۆی بێ لەگەڵ دەوران باسی بکا.

ڕەمزی: دەی کەیفی خۆیەتی.. زۆر پەلەشمان نییە.

Cut

دیمەنی – ٦١٢ – ڕ/ د – دوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( نەجات بە ماتۆڕەکەیەوە دێ و لای فیتەرەکە ئەوەستێ، دوو سێ ماتۆڕی لێیە فیتەرەکە خەریکی یەکێکیانە))

نەجات: خوا قوەتت با وەستا.

فیتەر: ئۆو سەرچاو کاکە نەجات(( سەیری باڵی ئەکا)) ئەوە چ خێرە؟

نەجات: هیچ نییە دوێنێ کەوتم، کەمێ بریندار بووە.

فیتەر: سەلامەتییە ئیشەڵڵا.

نەجات: ئەرێ مەجالت هەیە وەستا؟

فیتەر: وەڵا وا ئەبینی کاکە نەجات، بۆ لای نیوەڕۆ نایەیتەوە، هەرچی بفەرمووی لە خزمەتتان.. خۆ ڕاینەگرتووی؟

نەجات: نا کەمێک متە، ئەگەر سەیرێکت بکردایە.

فیتەر: نیوەڕۆ وەرەوە ئەتخەمە سەر هەردوو چاوم.

نەجات: باشە، نیوەڕۆ دێمەوە.

(( نەجات ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٦١٣ – ڕ/د – بەر دوکانی لەنگە:

(( حەمە خدر٣ بانگەوازی نۆک و پاقلەکەی بە شێوازی خۆی ئەکا.. شاموراد دێتە نزیکیەوە ))

شاموراد: وەزعت چۆنە نەگبەت؟ ئیشەکەت باشە؟

خدر٣: هەر زۆر زۆریش گەورەم، لەسای سەری جەنابتەوە.

شاموراد: ڕۆژیی چەندت بۆ ئەهێڵێتەوە؟

خدر٣: خوا نەیبڕێ.. بەشی خۆم بە زیادەوەو شتێکیش ئەمێنێتەوە.

شاموراد: یەعنی ئەوە نییە بیر لە ئیشێکیتر بکەیتەوە؟

خدر٣: نەوەڵا گەورەم لەسەرم دێ و لە پێم دەرئەچێ.

شاموراد؛ باشە هەرکاتێ دڵت لێی هەڵکەنرا، بە برای خۆت بڵێ، ئیشێکی پاک و تەمیزی وات بۆ ئەدۆزمەوە، لە هەفتەیەکا نیو سەعات بێ و پارەکەشی پەنجا ئەوەندەی ئێرە بێ.

خدر٣: دەستت ماچ ئەکەم گەورەم، ئەی باقی هەفتەکە چی بکەم، خۆ دڵم ئەتەقێ ئیش نەکەم.

شاموراد: باقی هەفتەکەش یا وەرە دوکانی ئێمە، یان هەر نۆک و پاقلەکەت بفرۆشە.

خدر٣: جا ئەگەر وابێ، ئێستاش ئەتوانم ڕۆژانی جومعە ئەو ئیشە بکەم.. ئەتوانم بپرسم ئیشەکە چییەو چۆنە؟

شاموراد: جارێ نا.. کەی دڵت لەم ئیشە هەڵکەنرا ئەوکاتە.

خدر٣: باشە زۆر مەمنونم گەورەم.. وا جارێ ئەمەم باشە.

(( شاموراد ئەگەڕێتەوە ناو دوکان و چپە لەگەڵ ئدریس ئەکاو خدر٣ش بانگەواز))

Cut

دیمەنی – ٦١٤ – مربوط – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆو شەنیا.. ))

شەنیا(( هێمن)): ناهەقت نییە تێت ئەگەم، لە دەستدانی خۆشەویستت بە ئازارە ئیتر بە هەر شێوەیەک بێت.

ئامۆ(( فرمێسک بە چاویەوە دیارە)): کەس ئەم برینەی پێ هەڵنەداومەتەوە تۆ نەبی.. لەو ڕۆژەوە من تەماشای ناوچەوانی هیچ کچێکم نەکردووەو بڕیاریشم وایە، بۆ تا هەتایە هەر بە یادی ئەوەوە بژیم.. ئیتر نە هاوسەرگیریی و نە پەیوەندیی، دوور ئەبم لە جیهانی مێینە.

شەنیا: ئاوا نازیت.. بەڵام ئەی چۆن بوو بۆ منت باسکرد؟

ئامۆ: من باوەڕم بە خورافیات نییە، بەڵام بەهۆی شێوەتەوە کە نزیکی لەوەوە، هەستم کرد ڕوحیانەتی ئەو لە جەستەتا نێژراوە.

شەنیا: ئەی کە وا ئەڵێی چۆن نەتناسیمەوە؟

ئامۆ: ئەوە تۆ بەڕاستتە؟ لە بینینتەوە لە دوکانی کارەباییاتەکەوە تا ئێستا ئارامم لەبەر بڕاوە، هەموو یادەوەرییەکانی ژیاونەتەوە، ئەمشەو لەگەڵ براکەم زۆرم خواردەوەو باسی تۆشم کرد.. کە چۆن پەیا بوویتەوە و وێرانت کردم.. تۆ منت خستەوە ئەو ڕۆژەی ئەوم تیا ناسی، تا ئەو ڕۆژەی وەرگەڕاو ئیتر نەمبینیەوە (( ئەگری)).

شەنیا: تکایە کاک ئامۆ، ئەگەر زۆر ناڕەحەتی ئەڕۆم، جارێکیتریش خۆمت نیشان نادەمەوە.

ئامۆ: جا دوای چی؟ هەموو برینەکانت کولاندمەوە.

شەنیا: ئەگەر سەبوریشت پێم دێت و ئەبمە مایەی ئارامیت، هەموو بەیانییەک بەیانی باشت ئەکەم و ئەوسا ئەچمە سەرکار.

ئامۆ: نازانم کامیان باشترە.

شەنیا: ئەوەندە لاوازیش مەبە کوڕی باش.. خۆگربەو ئازایانە بڕیاری خۆت بە.

ئامۆ: خۆزگە بمتوانیایە.

شەنیا: دەی خۆ ئەبێ من یەکێکیان بکەم، یان بێم و یان تا هەتایە نەمبینیتەوە.. ئێمە هاوڕێین کاک ئامۆ.. ئەبێ ڕێزی بڕیاری یەک بگرین.

ئامۆ: تۆ کامیانت پێ باشە؟

شەنیا: ئەوە تۆ ئەیزانیت و بڕیار لای تۆیە. من چوزانم؟

ئامۆ(( کەمێک بیرکردنەوە)): ژمارەکەتم لا جێهێڵە، سبەی پێت ئەڵێم.

شەنیا(( لەسەر کاغەزێکی بەردەستی ئامۆ ئەینوسێ)): ئەوەش ژمارە.. بە هیوای ئارامیی تۆ، من زۆر دواکەوتم، ئەبێ بڕۆم ببورە.

(( خواحافیزیی و لەبەرهەستانی ئامۆو ڕۆشتنی شەنیا ))

Cut

دیمەنی – ٦١٥ – ڕ/ د – چایخانەی هاوڕێ:

(( ١- تێبینیی بۆ دەرهێنەر/ ئەم دیمەنە دوو مانگ بەسەر دیمەنی پێش خۆیدا تێپەڕیوە. بە نزیکیی گەیشتووینەتە مانگی حوزەیران.

٢- هاوڕێ و ئەردەڵان دانیشتوون، شەنیا بە بەردەمیانا تێپەڕ ئەبێ. ))

ئەردەڵان: جا ئەمیش ئەڵێی داوی ناوەتەوە، جرت و فرت بەمناوەیا.. دە شووی پێ بکەو ببڕێتەوە.

هاوڕێ: ئەرێ هەتیو تۆ هەقت چییە بەسەریانەوە.. بەخوا شتێکی هەبێ لەگەڵیاو بەنیاز بێ بیهێنێ، شەرم لە کەس ناکاو لەخوا بەزیاد بێ لە هیچیشی کەم نییە.

ئەردەڵان: کورە هەی گەمژە کەمی چی؟ بەشی هەزار کەسی ڕەبەقی وەک من و تۆشی خواردووە.

هاوڕێ: جا تۆ چوزانی هەزار کەسی ڕەبەقی وەک من و تۆیە؟

ئەردەڵان: جا ئەوە باش بوو باسی ژمارەت کرد.. باوەڕ بکە هاتو چوونەکەیم ژماردووە هەزار کەرەتی ڕەبەق لەم دوو مانگەیا هاتووە بۆ لای.

هاوڕێ: ئەک خوا ڕووڕەشتکا بۆ خۆت و درۆت.. ئاخر هەتیو ئەگەر لە شەست ڕۆژا واتە دوومانگەکەی کە تۆ ئەیڵێیت و ئەگەر هەزار جار هاتبێ ئەزانی ڕۆژی چەند جار ئەکا؟

ئەردەڵان: تۆ چاو چاو چۆنم بۆ ورد ئەکاتەوە.. دەی چەن ئەکا؟

هاوڕێ: هیچ ناکەم ئێستا بۆ جەنابت قەڵەم کاغەز دێنم و جەمع و تەرحت بۆ ئەکەم، وانا؟ ئەبێ هەر بەتەما بی.. (( کەسێک داوای چا ئەکاو هاوڕێ هەڵئەسێ تێیکاو ئەردەڵانیش هەڵئەسێ )) مەڕۆ مەڕۆ، با جەمع و تەرحەکەمان بکەین.

((ئەردەڵان بێ وەڵام ئەڕوا))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٦١٦ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( ڕۆڤان پۆرترێتی نینا ئەکێشێ))

نینا: هەر ئێشت نەبوو وەرە بۆ ئێرە چی ئەکەی لەماڵەوە؟

ڕۆڤان(( بەدەم ڕەسمەوە)): تاقەتی ئێرەم لە کوێ بوو؟ من تا نیوەڕۆو عەسر ئەخەوم، خوای کرد دەوامم نەما، هەهە ئیتر خەو خۆشە.

نینا: ئای شەوانیش تا بەیانی دانیشی.

ڕۆڤان: کە خۆشە هەهە نە ورتەی یەکێ دێت، نە دەنگی سەیارەو کچێ دەنگی تەیروتیوریش نایەت.

(( گێلاس دێتەوەو پاش سڵاو و وەڵام و سەیرکردنی پۆرترێتەکەی نینا ))

گێلاس: واو چەند جوانە، خۆ لە خۆت جوانترە نینا.. ئەبێ ئەوە بۆ منیش بکەی ڕۆڤان.

ڕۆڤان: جا حەز ئەکەی ئەمەیان بۆ تۆ، من دانەیەکیتر بۆ خۆی دروست ئەکەم.

(( پێکەنی هەرسێکیان و گێلاس بە سوعبەت ئەکێشێ بە پشتی ڕۆڤاندا ))

گێلاس: من ڕەسمی ئەوم ناوێ ناشرین، هی خۆم ئەڵێم.

ڕۆڤان: هەهە من خراپ تێگەیشتم.. دە فەرموو دانیشە هەر ئێستا.

گێلاس: نا ئێستا ئەچمە سەرەوە، دووایی کە هاتمەوە.

ڕۆڤان: تا دێیتەوە من تەواوی ئەکەم پورێ گیان.

گێلاس: ئەی نابێ وەک نینا لە بەردەمتا دانیشم.

نینا: نا نا پورێ، ڕۆڤان بەس جوان سەرنجی کەسێک یان شوێنێک بدا، ئیتر هیچی ناوێ، وەک خۆی دەری ئەکاتەوە.

ڕۆڤان: ئینجا ڕوخساری تۆ پورێ گیان؟ هەر لە منداڵییەوە لەبەرمە هەهە

(( پێکەنینی هەموو))

گێلاس: ئەی خواردن هاتووە؟

نینا: شێتەکە هەمووی نارد.

گێلاس: دوو مانگ زیاترە، کچێ وا دوو مانگ و نیویشە چاوەڕوانی وەڵامە، وابزانم دووساڵ و نیوی تریش وەریناگرێتەوە، هههههە!

نینا: پەلەی چییە خۆ نانی بەساجەوە نەسووتاوە؟ هههە.

گێلاس: نا نا ئیتر وەختە.. دڵنیایکەوە. ئەها گۆرانییەکە ئەڵێ یا جوابێ بەخێر، یان دڵنیامکە.. تۆش وابکە.

نینا: باشە لەم هەفتەیەیا من و تۆ قسەی لەسەر ئەکەین.

گێلاس(( بە دەستێک ئەدا بەسەری خۆیا )): وەی باوکە، تازە قسەی لەسەر ئەکەین هههههە وەی قوڕ بەسەر ئەوەی ئومێدت لەسەر هەڵئەچنێ.

نینا: تەنها لەو بابەتەیا پورێ، ئەگینا خۆت ئەمناسی.

(( چوونە دەرەوەی گێلاس و وێنە کێشانی ڕۆڤان))

Cut

دیمەنی – ٦١٧ – ڕ/ د – بەردەمی کارگەی ڕاماڵ:

Mute

(( ڕەمزی لەناو سەیارەکەیدایە، ڕاماڵ کوڕێکی گەنجی سپۆرتی تەمەن ٣٠ ساڵ، بە خێرایی دێت و چاکەتەکەی داوە بەسەر یەکداو دەستی پێوە گرتووە.. لە میوتیدا هەندێک دایالۆگ و بەرێکردنی ڕەمزی))

Cut

دیمەنی – ٦١٨ – ڕ/ د – دوکانی قەسابیی حەمەتایەر:

(( حەمەتایەرو شەماڵ دانیشتوون))

شەماڵ: ئا تا سەعات چوار لە ئیشە، ئینجا توشیشی بووە بە توشی وەستایەکەوە، ئەڵێی بۆ ماڵی باوکی ئەکا، ئەوەنە وردەکارە لە ئیشەکەیا ئاکاری شێت کردووە.. تا سەعات چواری ڕێکیش بۆ نانخواردن نەبێ چوونە سەرئاویش نییە.. بەڵام ئەوەیە بەهۆی پاکیی ئیشەکەیەوە ناوەستن، ئیشیان زۆرە.

تایەر: دەی باش نییە ئیشەکەیان هەیە؟ ئەی ئەگەر نەبووایە؟

شەماڵ: نا نا شوکر باشن، هێشتا ئەو ئیشەیان تەواو نەکردووە...........

(( تایەر ماتۆڕسوارەکە ئەبینی تێپەڕ ئەبێت و دەست ئەبا بۆ کەمەری دەمانچە دەر بکا.. شەماڵ ناهێڵێ))

# (( ئەڵقەی سی))

تایەر: ئەوە ماتۆڕەکەبوو چی ئەکەی؟ دەستم مەگرە.. با لێرەوە ناوچەوانی بتەقێنم.

شەماڵ: لەم قەرەباڵغییەیا دەمانچەی چی دەرئەهێنی برا ((سەیری نەجات ئەکەن کە کەمێک تێپەڕیوە)) ئەوە ئەڵێی؟

تایەر: ئا ئا ئەوەیە.

شەماڵ: خێرا ناڕوا، بزانم نایگەمێ؟!

(( شەماڵ بە ڕاکردن دوای ئەکەوێ و تایەر سەیری ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٦١٩ – متبوع – ڕ/ د – سەر شەقامێک:

Mute

(( شەماڵ بەسەر شەقامێکدا بە ڕاکردن دوای ماتۆڕەکە ئەکەوێت، ئەو تیژتر ئەڕوات و لە سەری فەرعێکدا پێچ ئەکاتەوەو لە چاو ون ئەبێ، شەماڵ بەردەوام ئەبێ لە ڕاکردن))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٦٢٠ – متبوع- ڕ/ د – بەردوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( نەجات لەبەردەمی دوکانەکەدا ئەوەستێت، پاش سڵاو))

فیتەر: کێشەی هەیە دیسان؟

نەجات: شتێکی ئەوتۆ نییە، ئەگزۆزەکەی کونێکی بچوکی تێ بووە.

فیتەر: ئەوە هەرکێشە نییە، کاتێ بیهێنەوە دەستم بەتاڵ بێ ئیشی یەک دەقەیە.

نەجات: ئەی بۆ ئێستە نایکەی کە ئیشی یەک دەقەیە؟

فیتەر: نابینی خەریکە تێک ئەچم بەدەست ئەمەوە؟

نەجات(( ئامادە بۆ ڕۆشتن)): نەوەڵا هههە. (( شەماڵ لە سەرجادەکە دەرئەکەوێ دێتە سەر سووچەکەو چاو ئەگێڕێ، کە نەجات ئەبینێ تاو ئەداتە بەر خۆی و بەڕاکردن دێت.. نەجات ئەڕوا.. شەماڵ ئەگاتە بەر دوکانی فیتەر))

شەماڵ: سڵاو برا.

فیتەر(( ئاوڕ ناداتەوە)): سەرچاو.

شەماڵ: زەحمەت نەبێ ئەو ماتۆڕ سوارە کێیە؟

فیتەر(( ئاوڕ ئەداتەوە)): جا کە نایناسی بۆ هەواڵی ئەپرسی؟

شەماڵ(( دەمانچەکەی پێ نیشان ئەدا)): پێموتی کێیەو خێرا وەڵامیشم بدەرەوە.

فیتەر: ئا، ببورە.. بەخوا نایناسم.. ئەوەنە ئەزانم ناوی نەجاتەو هیچیتر.

شەماڵ: باشتر وایە جێگەو ڕێگەیم پێ بڵێی، ئەگینا سەلامەت نابی.

فیتەر: کاکە بڕوام پێ بکە نازانم، ئەو تەنها ماتۆڕی پێیەو منیش وەستای ماتۆڕەکەی.

شەماڵ: کێشە نییە سەرت لێ ئەدەمەوە.

(( شەماڵ ئەگەڕێتەوەو فیتەرەکەش دەست ئەدا بەیەکاو سەر بائەدا، وەک بڵێی توشی کێشە بووە))

Cut

دیمەنی – ٦٢١ – ڕ/ د – بەردوکانی لەنگە:

(( خدر٣ بەدیار عەرەبانەی نۆکاوەکەوە تێل ئەکا ))

خدر٣: نا نا لەوێ نەماوم....... ئۆو لە بنی دنیام، گواستومەتەوە بۆ دەرەوەی شار.......... (( شاموراد لێی نزیک ئەبێتەوە لە پشتەوە )) ............. مەگەر جومعە دەستم بەتاڵە بتوانم بتبینم لە شوێنێک .............. (( هەست بە شاموراد ئەکاو خۆی تێکنادا..)) .. بیلێرەوە باش تێ ناگەم شەبەکەت نییە.......نا خوشک گیان، چۆن برا پشت ئەکاتە خوشکەکەی، ئەگەر دێی بۆ ماڵی من لە خزمەتتام و یان من دێم بۆ ماڵی ئێوە.. بەخوا زۆر ماندووم، ئەو شەش ڕۆژە هیچم پێ ناکرێ، هەر جومعەکەیە.. ...... ئەی خوا هاوار، هیچ شەبەکەی نییە، بەخوا تێناگەم........ ئەرەوەڵا خەریکی ئیشەکەم........... خوات لەگەڵ...... (( بەدەنگی بەرزو وا نیشان ئەدا ئاگای لە شاموراد نییە نۆکاو و پاقلەکە بە ئسلوبی خۆی ئەڵێت و لە نیوەیا شاموراد ئەبینێ و بانگەوازەکەی ڕائەگرێ )) ببورە گەورەم نەمبینیت.

شاموراد: ئەوە خوشکت بوو قسەت لەگەڵ ئەکرد؟

خدر٣: بەڵێ گەورەم.

شاموراد: جا نەگبەت بۆ هامشۆی ناکەی؟ خوشک گوناحە!

خدر٣: گەورەم ماڵی لە کوێرە دێیەکە، بە مۆبایلەکەش بە زەحمەت گوێم لە دەنگی ئەبێ.. کە بەیانی چووم شەو ئەگەمەوە ماڵەوە، ئەوەش هەموو حەفتەیەک ناکرێ و ئەویش زۆر خۆش گلەییە.

شاموراد: ئەرێ تاقەتت لەم ئیشە نەچوو؟ دوو مانگە من چاوەڕێم تاقەتت بچێ و بێیتە لای خۆمان.

خدر٣: گەورەم من بچوکی ئێوەم هەر لای خۆتانم.. بەڵام وا ئیتر ئیشەکە ڕووی لەهاتەو داهاتی زۆر زۆر بووە، ئێستا هەرچەن ئەکەم پێڕاناگەم، هەر کیلۆ کیلۆ نۆک و پاقلە زۆرتر ئەکوڵێنم و هەر زوو تەواو ئەبێ.

شاموراد: دەی باشە لەبیرت بێ، ئەگەر تاقەتت چوو قسە بکە.

خدر٣: گەورەم ئەگەر ئیشەکە لێرەوە بە من ئەکرێ لە خزمەتدام.. هەرچییەک بێ ئاگام لە عەرەبانەکەش ئەبێ و ئیشەکەی ئێوەش ئەکەم.

شاموراد: نا نا وا ناکرێ، ئەبێ خۆتی بۆ تەرخانکەی.

خدر٣: هەرکاتێ ئەمە وشکی کرد، لەخزمەتدا ئەبم، بەڵام وا جارێ خەڵکەکە پێی ڕاهاتوون.

(( خدر٣ قسەکانی تەواو نەکردووە، شاموراد جێی ئەهێڵێ.. بە دەنگێکی نزمتر بانگەوازی نۆک و پاقلەکەی دەست پێ ئەکاتەوەو هاوکار بە سینی و تەرمۆزەی چاکەوە دێت))

هاوکار: کاک سمکۆ سەمون نۆکاوێک، زۆرم برسییە.

(( هاوکار لە میوتیدا سەمون و نۆکاو ئەخوات.. گەر خەڵکی تریش هەبێت))

Cut

دیمەنی – ٦٢٢ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( ڕاهۆزو سەرکۆ))

سەرکۆ: وەزعی کۆژین چۆنە؟

ڕاهۆز: گەورەم ئەمشەو لای بووم.. زۆر باشن، هەواڵی ئەپرسیت.

سەرکۆ: مۆڵەتەکەی زۆرە.. وابکەین ئەگەر مەسەلەی ئەو نەزۆکییەی شتێ لا ئاسان بوو بێت، بیهێنینەوە.

ڕاهۆز (( خەندە)): گەورەم خۆشی بێتاقەت بووە.. ژیانیان زۆر خۆشە، ئەو دڵی بێستان خان ئەداتەوە، هیچ بە لایەوە مەسەلەیەک نییە.

سەرکۆ: ئای.. منیش وا هەست ئەکەم.. چونکە بێستانی زیاد لە پێویست خۆش ئەوێ.

ڕاهۆز: هەر مەپرسە گەورەم.

سەرکۆ: باندەکە هەر کپن؟

ڕاهۆز: گەورەم ئەمجارەیان جوڵەی گەورە لە خۆمانەوە ئەبێت، ئێستا ئەوان هەست بە هیچ جۆرە چاودێرییەک ناکەن و پێیانوایە ئەوی کردیان تێپەڕی و ڕەنگە نەشچنەوە سەر ئیشی پێشوویان، من وای بۆ ئەچم بە نیازی ئیشی گەورەتر بن.. ئیشی گەورەمان لەسەر کردوون، جارێ کاتی جەنابتی پێ ناگرن.

Cut

دیمەنی – ٦٢٣ – ڕ- ئێوارە/ قاوەخانەیەک:

(( شەنیاو ڕاماڵ))

شەنیا: ئەزانم زۆرت هەیەو قەت درێغیی لە من ناکەیت و هەرچیم بوێ، تۆ ئەوە ئەکەی.. بەڵام ڕاماڵ گیان خۆشەویستیی زاراوەیەک نییەو بەس.. کەمێک بیویژدانیی بنوێنم و وەکو دڵنیای هاوڕێم بکەم، هەزار قسەی زەردو سوورت بۆ ڕیز ئەکەم.

ڕاماڵ: من نازانم دڵنیای هاوڕێت چی ئەکا؟ بەڵام خۆ تۆ باش ئاگات لەوەیە تۆ هەموو ژیان و خیاڵ و ئاسمانی منیت.

شەنیا(( ئیحراج)): هاوڕێ گیان ئەوە بەس نییە، شتێک هەیە پێی ئەوترێ هەست و لە مندا نییە بەرامبەر بە تۆ، ئەمەم هەزارجار پێوتووی.. باوەڕ بکە ئەو هەستەم بەرامبەرت هەبووایە، چاوەڕوانی قسەی تۆم نەئەکرد، تکایە حەز ئەکەم لەوە تێبگەیت و کاتی خۆت لەگەڵ منا بە فیڕۆ نەدەی.

ڕاماڵ: شەنیا گیان خۆشەویستی ئەوە نازانێ، من ئامادەم گیانم ببەخشم لە پێناوتا.

شەنیا: ئەوە چییە ئەو قسانە ڕاماڵ؟ بە ڕاستی هیچ گرنگ نیین بەلامەوە، خۆ من لە شەڕا نیم برا، ئیتر ئەم گیانەت بۆ بەخت ئەکەی؟

ڕاماڵ: بەو هیوایەم بە تێپەڕینی ڕۆژ بزانیت کەس نییە لە من دڵسۆزترو بە هەموو ژیانیشت کەسێکیتر نابینیتەوە بەقەدەر منی خۆش بوێی.. ئەو کاتەی لەوە گەیشتی، ئەو هەستەشت لا دروست ئەبێ.

شەنیا: بە ڕاستی زۆر زەحمەتە.. بەڕای من کوڕو کچیک سەرەتای یەکتر ناسینیان چۆن بڕواننە یەکتر، هەروا ئەمێننەوە.. گەر ڕوویدابێ هاوسەرگیریشیان کردبێ.. مەگەر ناچارییەک بەسەر ئەوەیاندا هاتبێ کە هەست و سۆزی بۆ ئەویتر نەبووە.. ئەگینا ئەوە مەحاڵە.

ڕاماڵ: ئەی ئەگەر تۆ ئەو ناچارییەت بەسەرا هات؟

شەنیا(( بزە)): کەمێک وریام ڕاماڵ، باوەڕ مەکە. ________________ Cut ________

دیمەنی – ٦٢٤ – ش/د – باخی ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆ))

ئاکۆ: کچێ دیارت وا خەریک کردووە، باوەڕ بکە ئەمڕۆ زۆر بیریم ئەکرد، چووم بۆ ئوتێلەکە بۆ لای هەهە.

گێلاس: قەینا بە قوربانی بم، با فێر بێ.. دایکی بمرێ یاخوا، هەر زۆری حەز لە ئیشەکەیە.

گێلاس: دەی مادام حەزی لێیەتی، یاخوا دایکی نەمرێ و بۆی بمێنێ.

گێلاس: قوربانی تۆش بم.

ئاکۆ: ئیش و کار لە تەرەقیایە؟

گێلاس(( پۆزێکی ژنانەی سوعبەت)): هەر زۆر باشە، دە بەسی لێ بڵێ هەهە.. بەڵام خەریکە ئوتێلەکەی سەر ئەرزەکەی خۆمانم بیرچێتەوە.

ئاکۆ: دەی ئاخر کرێی ئێرەش زۆرە، تۆ ئەو کرێیەشت بۆ ئەگەڕێتەوە.

گێلاس: کێشەی کرێم هەر نەماوە ئاکۆ.. وردە وردە بیر لە ڕێستۆرانتێکی ڕاقی ئەکەمەوە، بەو خواردنانەی کە ئێستا هەمانە.

ئاکۆ: ئەبێ وەستاکانیش بەری بۆ ئەوێ، ئەوکاتە ئیشی ئێرەت ئەشکێ و ئیتر خەڵک نایا بەلایاو تا ئەولاش ئەناسرێ زۆری پێ ئەچێ.

گێلاس: ئەها کە ئەڵێم تۆ داماوی و هیچ نازانی.. فەقیر وەستای ئێرە دەست لێ نادەم.. بە ئاوا ئەڵێم دنیایەک وەستام بۆ ئەهێنێ.

ئاکۆ: جا ئەگەر کچەکەش بە ئاوا ڕازی نەبێ، ئەوکاتە ئاواش ئیشت بۆ ناکا، ئەی چۆن؟ هەهە

گێلاس: یەکەم، ئاوا خوا هەڵناگرێ ئەڵێ هەتا مردن کچ ببێ و نەبێ، هەرچیت پێویست بوو بە کوڕی خۆتم بزانەو بە منی بڵێ، چونکە کوڕی گەورەت نییەو کاک ئاکۆش نایپەرژێ.

ئاکۆ: ئاوا کوڕێکی چاکە ، ماڵی ئاوابێ... ئەی دووەم؟

(( ئەکرێ لە میوتیدا قسەکەی تەواو بکا ))

Cut

دیمەنی – ٦٢٥ – ش/ د – ناو سەیارەی نیزام:

(( نیزام و هەڵشۆ))

نیزام: کاکە هەڵشۆ من لەوە ئەترسم پاشا لێمان هەڵپێچێ.

هەڵشۆ: ئێمە ئیش ئەکەین نیزام گیان، ئیشیش بە پەلە ڕاناپەڕێ.. نە پاشاو نە باوکیشی ناتوانن ئیشێکمان پێ بکەن بکەوینە هەڵەوە.. ئەوسا خۆشی تیائەچێ، خۆ هەر ئێمە نابین.. گرنگ ئەوەیە نەوەستین و قۆناغ بە قۆناغ ئەو ئیشانە بچنە پێشەوە.

نیزام: هەر زۆر باش ڕۆشتووە، وا دوو سێ مانگە.. ئێستا گەیشتۆتە ئەوەی ئیتر پێ بگا.

هەڵشۆ: ئەی ئیتر لە چی ئەترسی؟

نیزام: لەوەی خۆشم ئەو کاتە زۆرە ئارامم گرتووەو ئیتر چاوەڕوانی دەسکەوتەکەیم.

هەڵشۆ: هههە کەواتە ئێستا ئەبێ پاشا پێت بڵێ، نیزام گیان تەحەمولت هەبێ، پەلە مەکە.

نیزام: من بەس لە پەلەپرۆزێ ئەترسم کە داوام لێ بکا.. ئەگینا بەم نزیکانە من یەکەم دەسکەوت ڕائەگەیەنم.

هەڵشۆ: ئەمجارەی دوایی کە بینیم، داوای شتی قورستری ئەکرد.. ئەیوت هیچ یەکێک لەو ئیشانەی ئێستا ئەکرێ، دڵخۆشکەر نیین.

نیزام: ئەی بە نیازی چییە؟

داوای یەک دوویەکی وریاو چاونەترسی ئەکرد، بۆ تلیاک.

نیزام: ئۆۆۆۆۆۆوووو!

Cut

دیمەنی – ٦٢٦ – ش/ د – بەردوکانی ڕێژوان:

(( دزێک دەرگا یان دەرابەی دوکانی ڕێژوانی بۆ ئەکرێتەوەو تورەکە یەن گوێنییەکی پێیەو بەرەو مۆبایلەکان ئەچێ.. ئاوڕێکی دەرەوە ئەدات و پاسەوانی شەوانەی مەدەنیی دوکانەکان ئەبینێ))

پاسەوان: کاک ڕێژوان خۆتی؟

(( دزەکە هەڵدێت و پاسەوان هاوار ئەکا ئەوە دزە دز هاتۆتە سەرمان.. چەند کەسێک تاک و تەرا کۆئەبنەوەو پاسەوان پێیان ئەڵێ بەوێدا ڕۆشت و هەموو بە ڕاکردن وەک دوای بکەون بەو شوێنەدا ئەڕۆن.. دواتر پاسەوان ئەگەڕێتەوەو قفڵێک ئەدا لە دەرابەکە ئەگەر دەرابە بوو.. ئەگەر دەرگای تریش بوو بە وایەر یان حەبلێک دەسکەکانی پێکەوە ئەبەستێتەوەو لە بەردەمیا دائەنیشێ))

Cut

دیمەنی – ٦٢٧ – ش/ن – ژووری پاشا:

((شاموراد لە بەردەمی پاشا وەستاوە، پاشا بە دەمامکەوە وەک هەمیشە))

پاشا: دوو مانگە پێت وتووەو نایەتە پێشەوە؟

شاموراد: بەڵێ پاشا گیان، ئێستاش ئەڵێ ئیشەکەی خۆم لە هەموو ئیشێک باشترە.

پاشا: من ئەوەم ئەویست.. کەوابێ ئەو کابرایە لە هیچ شوێنێکەوە بۆ تۆ دانەنراوەو هەر بەڕاست کاسبە.. ئێمە چاودێریی باشمان کردو ماڵەکەیمان دۆزییەوە، لە کاولەیەکا ئەژی جێی بەشەر نییە، ڕێک لە کولانەی مریشک و کەڵەشێر ئەچێ.. ماڵێکی دراوسێیان هەیە ئەوان نۆک و پاقلەکەشی بۆ ئەکولێنن.. خەڵکیشمان ناردە ماڵەکە، دەرکەوت بە کرێ ئیشی بۆ ئەکەن.. سمکۆ هیچێکی ئەوتۆی نییە جێی گومان بێ.. خەڵکی کوێرە دێیەکن و ئێستاش کەسوکاری لەوێ ئەژین.

شاموراد: بەڵێ پاشا گیان، ئەمڕۆش گوێم لێ بوو لەگەڵ خوشکەکەی قسەی ئەکرد، شەبەکەی باش نەبوو، زۆر لە یەکتر حاڵیی نەئەبوون، بە قسەکانیشیا دیار بوو و وتی ئەوە خوشکمە لە کوێرە دێیەک ئەژی .

پاشا: دەی ئیتر تێستی بکەو بزانە حەزی لەو ئیشانە هەیە یان نا؟.. ئێستا ئەو هەتیوانەش هێور بوونەتەوە، بەڵکو ئەمەش ڕازی بێ و یەک دووانێکیان بکوژێ. ئێستا کاتیەتی.

شاموراد: بەخوا پاشاگیان ئەم کەللە شەق و شڕەو ئیشەکانی خۆمانیان نەوتووە، هەر داڵغەی لەسەر نۆک و پاقلەیە.

پاشا: من وتم هەوڵی لەگەڵا بدە، ئەگەر هەر ڕازیش نەبوو، شەوێک لە گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە، بە فیشەکێک لە کۆڵ نۆک و پاقلەکەی ئەکەینەوە.

شاموراد: فەرمانتە پاشای گەورەم.

Cut

دیمەنی ٦٢٨ – ڕ – بەیانی زوو / ن – ماڵی ڕێژوان:

(( سەلوا خەریکی نان و چا ئامادە کردنەو ڕێژوان نوستووە.. بە زەنگی مۆبایلەکەی خەبەری ئەبێتەوە ))

ڕێژوا: بەڵێ فەرموو............ چۆن چۆن؟ ئەوە بەڕاستتە کاک سەریاس؟ ............ ئەمە کەی؟ ................ واهاتم زۆر سوپاس هەر ئێستا.(( هەڵئەسێ بۆ خۆ گۆڕین ))

سەلوا (( دێتە ژووری نوستنەکە )): ئەوە چی ڕوویداوە؟

ڕێژوان: کچێ هەستە خۆت بگۆڕە فریای دوکانکەوین.. ئەمشەو دز دوکانەکەی بڕیوین.

سەلوا (( ئەکێشێ بە خۆیا )): وا نەڵێی.. هەمووی دزراوە؟

ڕێژوان: کاتی قسە نییە، ئەڵێ پاسەوانی دوکانەکان ئاگادار بووە.

سەلوا: با ئاگری ئاو و چاکە بکوژێنمەوە.. هەر ئێستا خۆم ئەگۆڕم.

(( چوونە دەرەوەی سەلوا بە خێرایی ))

Cut

دیمەنی – ٦٢٩ – ڕ– نیوەڕۆ/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

Mute

(( هەڵشۆ لە تەکسیەک دائەبەزێت و بەرەو کۆمپانیای ئاوا ئەچێت))

Cut

دیمەنی – ٦٣٠ – ڕ/ن – پیشانگەی مۆبایلەکەی ڕێژوان:

(( ڕێژوان بە پێوە تێل ئەکاو سەلواش دانیشتووە ))

ڕێژوان (( بە خۆشییەکی زۆرەوە )): بە ڕاستە چیمەن گیان؟ توخوا بەڕاست، قوربانت بم قوربانت بم (( سەلوا سەیری ئەکا )) ئەمە کەی؟

چیمەن (( دەنگ )): ئێستا کامەرانی شووبرام تێلی کرد وتی تەماشای هەواڵ بکە.

ڕێژوان: کچێ قوربانی تۆ.. ئاگات لە خۆت بێ چیمەن گیان، تکایە ئاسایی وەریگرە.

چیمەن: ئاسایی چی؟ ڕێژوان گیان، هەواڵێکی ئەوەندە خۆشە چۆن ئاسایی وەرئەگیرێ؟

سەلوا: چی بووە ڕێژوان؟

ڕێژوان(( بۆ سەلوا )): باوکم بەر ئەبێ سەلوا باوکم، لێبوردنی گشتییە

(( بە تەلەفونەکەوە مەشغوڵ ئەبێ ))

Cut

دیمەنی – ٦٣١ – ڕ/ن - کۆمپانیای زوبێر/ژووری زوبێر:

(( ئاواو هەڵشۆ دانیشتوون))

هەڵشۆ: بەخوا ئاوا منیش وەک ڕەحمەتیی لە ماڵی ئێوەیا بەس دڵم بە تۆ ئەکرێتەوە.

ئاوا: جا ڕەحمەتی کەی وابوو کاکە؟ بەڕاستی باوکێکی نموونەیی بوو، فەرق و جیاوازیی لە نێوانی هیچمانا نەکرد تا چووە جێی خۆی.

هەڵشۆ: نا ئاخر کەمێک تۆی زیاتر ئەلاواند.

ئاوا: نا، من زۆر ئاسوودە بووم کاتێ ئەمبینی فەرق و جیاوازیی لە نێوانمانا ناکاو کەسیشی لەویتر زیاتر نەئەلاواند.

هەڵشۆ: دەی ئەو وانەبوو، من وام.

ئاوا: پێم ناخۆشە هیچ کەسێک وا سەیرمان بکا، برادەر ئەبێ من و کاکم وەک یەک سەیر بکاو خزمیش هەموومان.

هەڵشۆ: بەڵێ باشە.. تۆ ئاگات لێیە تریفە قاوەخانەکە، تەنها یادگاریی باوکتی فرۆشتووە؟

ئاوا: بەڵێ، کە باسی وەزعی خۆی کرد بە دەست تۆوەو ئەو بەربەرەڵاییەی دەستت داوەتێ، خۆم مشتەریم بۆ دۆزیەوە.. خراپی کردووە؟

هەڵشۆ: دیارە ئەم ژنە لە هەموو شوێنێک منی شکاندووە.

ئاوا: جارێ ئەوە لە هەموو شوێنێک نییەو لای برای خۆی قسەی کردووە.. ئەوسا درۆشی نەکردووە.. ئەزانی ئەگەر ئەو شەوگەڕییەت تەرک نەکەی، قبوڵی ناکەم؟

هەڵشۆ: کاکە ئاوا گیان لەبری ئەوە قسەیەکی باش بکەی چاکترە.

ئاوا: بەڕاستی من خوشکی خۆمم لێ زیاد نییە بیدەمە دەست کابرایەکەوە هیچ پابەند نەبێ بەخێزانەوەو ماڵ وەک ئوتێل سەیربکا.. ئەگەر ئەتەوێ پێکەوە بمێنن، ئەو کردەوە خراپانەت وازلێبێنە.

هەڵشۆ: ئامۆش وەک تۆ قسەی لەگەڵ ناکرێ و دایکیشت لەو خراپتر، نازانم قسە لەگەڵ کامتانا بکەم، یەک لەیەک زیاتر ئەیشێوێنن.

ئاوا: ئاخر پیاوێکی زۆر ڕێک و پێکی بۆیە!

هەڵشۆ: وابزانم گەیشتووینەتە بنبەست؟! هەر نەتهێشت منیش شتێ بڵێم.

ئاوا: بەڵێ تۆی گەیاندووتە بنبەست، هەر شەوەی لە ماڵێک ڕۆژ ئەکەیتەوەو کەسیش ئەو شوێنانە نازانێ، ئیتر گوێ لە چیت بگرم؟

هەڵشۆ: دەی مادام وایە خۆم ئەزانم چی ئەکەم!

ئاوا(( تورە)): بێمنەتبە چیت لەدەست دێ بیکە، هەر ئێستا تەلەفونیش بۆ تریفە ئەکەم بگەڕێتەوە ماڵی خۆمان.. باش نەبوو منداڵتان لە بەینا نەبوو؟!

هەڵشۆ (( هێمن)): بهێڵە خۆمان بگەینە ئەو بڕیارە، یان بەرنامەیەکی بۆ دابنێین کاکە ئاوا.. تۆ مەبە بە باعیسی ژیانی ژن و مێردێک.. ببورە ئەگەر هەڵەیەکم کردبێ، من دڵی تریفەش چاک ئەکەمەوەو ژیانمان ڕێک ئەخەمەوە.

ئاوا: دەی ئێمەش ئەوەمان لە تۆ ئەوێ.. تا ئێستا ئێمەت بینیوە بێینە هیچ کێشەیەکتانەوە؟ بەڵام ئەمجارە ترێ پڕ بووە.. دڵی ئەو چاک بکەو هەرچییەکیشتان پێویست بوو، ئێمە هاوکاریتان ئەکەین.

هەڵشۆ (( هەڵئەسێ)): باشە ماڵتان ئاوا بێ، ئاواهی عەنبابییە.. خواحافیز.

(( چوونە دەرەوەی هەڵشۆو خواحافیزیی ئاوا، لەبەری هەڵناسێ))

Cut

دیمەنی – ٦٣٢ – ڕ/ د - دوکانی دوکانی قەسابیی تایەر:

(( تایەرو باوکی خەریکی گۆشت کێشانن بۆ کەسێک.. ئاکارو شەماڵ و برزو و دێنە بەردەرگاو بانگی تایەر ئەکەن))

ئاکار: سەلام و عەلەیکوم، مامە گیان چۆنی؟..(( دوای وەڵام)) تایەر بە یارمەتی!

تایەر: باوە گیان تۆزێکم پێ ئەچێ و ئێستا دێمەوە.

باوک: زۆرت پێ نەچێ کوڕم، بە تەنیا دەرەقەت نایەم.

تایەر: بەسەرچاو باوە گیان خەمت نەبێ.

(( ئەڕۆن و لە شەقامەکەدا نیشان ئەدرێن))

_________ تابع _________________ Cut _____________________

دیمەنی – ٦٣٣ – متبوع – ڕ/ن – کەمێک لە سەروو دوکانی قصابییەکەوە:

(( ئاکارو شەماڵ و برزو و تایەر))

ئاکار: وەختیەتی با بڕۆین.

تایەر: ئێستا باشە؟

سەماڵ: هەر زۆریش.

تایەر: یەک دەقە بە باوکم ئەڵێم و سەیارەکەش لە گەراج دەرئەکەم.. ئێوە بڕۆن پێتان ئەگەمەوەو هەڵتانئەگرم.

برزو: کەمێ دەستوبرد کە کاکە.

(( ئاکارو شەماڵ و برزو بەرەو لای ژووروو ئەچن و تایەر بۆ دوکانەکەیان))

—— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٦٣٤ – متبوع – بەردوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( ١- تێبینی بۆ دەرهێنەر: ئەکرێ تا گەیشتنیان بە دوکانی فیتەرەکە بە میوتی چەند دیمەنێک هەبێت.

٢- تایەرو ئاکارو شەماڵ و برزو و هاوکار، دێنە بەردەمی دوکانەکە.. دوای سڵاو))

شەماڵ: ئەو هەتیوەی دوێنێمان ئەوێ کە وتت ناوی نەجاتە.

فیتەر: باوەڕ بکە ماڵ و شوێنی نازانم، ئەو هەرکاتێ ماتۆڕەکەی عەیبێکی تێ بکەوێ، ئەیهێنێ و هیچیتر.. ئیتر هەر ناشزانم کێیەو کوڕی کێیەو چ کارەیە.

تایەر: من ژمارەکەی خۆمت ئەدەمێ، ئەمجارە کە هات دوای بخەو پێم بڵێ کە سەعات ئەوەندە بگەڕێتەوە(( دەمانچەی پێ نیشان ئەدا)) ئەگینا تۆ لە بری ئەو تیا ئەچی، تێگەیشتی.

فیتەر: بەسەرچاو برا.. ژمارەکەتم بدەرێ و هیچ خەمت نەبێ، دڵنیابە وا ئەکەم.

(( تایەر ژمارەی ئەداتێ و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٦٣٥ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

((گێلاس و نینا دانیشتوون))

نینا: من لاریم لە خۆی نییە، بەڵام ئەو ترسەم هەر هەیە.

گێلاس: کەواتە هەرکاتێ ترسەکەت ڕەویەوە بڕیار بدە.

نینا: هەرچەند غەدریشم زۆر لێکردووە، من ئەزانم ئێستا چۆن بۆ من ئەژی.. دڵنیام خەو و خەیاڵی هەر منم.

گێلاس: ڕاستیەکەی من لە تۆ ناگەم، کە ئەزانی غەداری و غەدری لێ ئەکەی، کە ئەترسی و پێی ناڵێی، کە خۆشت ئەوێ و دەری نابڕی، کە بیری ئەکەیت و کاردانەوەت نییە، کە ساردو سڕی و لە ناخا گەرم.. ئەرێ ئەم هەموو لوغزە چییە کچێ؟ وەڵاهی من بم لەبری ئەو کوڕە، ئیهمال کردنێ ئیهمالت ئەکەم هەر بیری لێ نەکەیتەوە.. ئۆۆۆی ئەمە چییە؟

نینا: هەموو قسەکانت ڕاستن.. باشە ئێستا من چی بکەم؟ بەڕای تۆ.

گێلاس: بە ڕوونیی قسەی لەگەڵ بکەو باسی ترسەکەی خۆتی بۆ بکە.. دڵ گۆشتە گۆشت کچێ، خۆ داروبەرد نییە، کە تۆرا، بە شۆڕشی باوکیشت نایەتەوە جێی خۆی.

نینا: نەوەڵا بە شۆڕشی باوکم هەر نایەتەوە هەههههە پورێ قسەی سەیر ئەکەی.

گێلاس: بەخوا من بێتاقەت بووم، ئینجا ئەو داماوە.

نینا: دەی دوایی تەلەفونی بۆ ئەکەم و پێی ئەڵێم تۆ داوات کردووە.. کە هات بزانە چی پێ ئەکەم؟

گێلاس: ئەیکەیتەوە بە فشقیات؟

نینا: دەی بەخوا پورێ هەر فشقیاتەکەی خۆشە.. چییە؟ با یەک دووساڵێ هەروەک جاران هاوڕێ بین و یەکتریش باشتر ئەناسین.

گێلاس: ئەویش شێتە وانییە؟

نینا: ئەی تەبعەن، هەر ئەو شێتە.(( ئاوا دێتە ژوورەوە )) سوبحانەڵڵا پەیا بووەوە.

ئاوا: چۆنی گێلاس خان؟

گێلاس: سەرچاوم باوکەکەم، وەڵڵاهی خەریکە تێک ئەچم لە داخی ئەم شتە پیسە.

نینا(( بۆ ئاوا، لچی وەک گریانی مناڵ شۆڕ ئەکاتەوە )): ئەها چیم پێ ئەڵێ؟!

ئاوا(( حەپەساو )): پورە گێلاس بەردەوام لەسەر هەقە، هەرچی ئەو بیڵێ ڕاستە.

نینا: ژەقنەمووت.

ئاوا: ژەقنەمووت نا شتەپیس زەقنەبووت.

نینا: جا کە شتەپیسم، بۆ دەوروخولم ئەیەی؟

گێلاس(( پێکەنینی زۆر )): بە بۆنەی ئاشتبوونەوەی گشتییەوە، من دەعوەتێکی نایابم ئەوێ.. شەممەو لە سەیرانێکی خێزانیدا.

ئاوا: ئەگەر پۆلیسەکە ڕازی بێ، بەسەرچاو.

نینا: پۆلیسەکە دەمێکە ڕازییە، ئەوە منم هەموو شتێکم ڕاگرتووە..

ئاوا: جا بۆ؟ خێرت ئەگاتێ؟

نینا: موستەحەقی و شایانی خراپترینی هەی شتەپیس.

ئاوا: پورە گێلاس ئەمە بە ڕازیی بوون وەرگرم.. شەو دایکم و کاکم بنێرم؟

نینا: بۆ کوێیان ئەنێری ڕەزات خواتەوە؟.. من تەنها ئاشت بوومەوەو هیچیتر.

گێلاس: ئەی ئەوانیتر؟

نینا: با بمێنێ.. با ئەوەندە دڵ خۆش نەکا.. ئاشت بوونەوەو هیچیتر.. ئەویتر پەلەم نییە، با دە دوانزەساڵێکیتر بخایەنێ.

ئاوا: ئای چەند خۆشە ئەوسا کچەکەم گەورە بووەو ئەبێ بە هاوڕێت و پێت ئەڵێ، پوریێ باوکم ئەیوت با هەر بۆ خۆی چاوی زەقەی بێ و جارێ پەلەی وەڵامدانەوەی نەبێ.

نینا: ئەوسا منیش پێی ئەڵێم تۆ هاوڕێی کوڕەکەمی باوانم، چی ئەکەی لەلای من (( زمانی دەرئەهێنێ و سەری لێ با ئەدا وەک گاڵتە پێکردن)) ئا کچە دوانزە ساڵەکەت ناو ئەنێی چی؟

ئاوا: نینا.

نینا: دەمنیش ئەگەر ئەو منداڵەم کە کوڕ بوو ناوی ئەنێم شۆڕش، بە ناوی باوکمەوە.

ئاوا(( ختوکەی خۆی ئەدا)): ئەوە چی بوو هەزەلی قرتام!

گێلاس: زۆر لە ڕاست ئەچێ، کێ ئەڵێ وا نابێ.

نینا: ئەگەر واش بێ......

ئاوا(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): ئەی نەیخۆی تاڵە، کێ حەددی هەیە لێت بێتە پێشەوە؟ لە خۆم زیاتر؟

نینا(( لچ با ئەدا)): چییە هەزەلی غیرەت کرد؟... ئە گەر واش بێت، من کێشەیەکم نییە.

ئاوا: باشتر وایە پێش ئەوەی منداڵمان ببێ، جارێ بچینە سەرەوەو نانێک بخۆین.

گێلاس: کورە نانی چی من بۆ ئیشی ڕێستورانتەکە بانگم کردووی!

ئاوا(( بۆ نینا)): دەی دوای ئەوە ئەچین، وتت چی؟

(( نینا سەر ئەلەقێنێ نیشانەی ڕەزامەندیی و ئاوا ئەچێتە لای گێلاسەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٣٦ – ڕ/ د – دوکانی لەنگە:

(( شامورادو خدر٣ دانیشتوون و ئدریس لەسەر عەرەبانەی نۆکاوەکەیە خەڵک بەڕێ ئەکا ))

شاموراد: ئیتر کەسێک هەیە بۆ پاشای بکوژی، ئەوە پارەیەکی وات ئەداتێ، خۆت نەیەیتەوە سەر عەرەبانەی نۆکاوەکەت.. ماڵت ئەهێنیتەوە ناو شارو ئیتر بۆ خۆت پێی لێ ئەکێشیت و ئەحەسێیتەوە.

خدر٣: نەبەخوا من ئەهلی ئەو شتانە نیم گەورەم، خۆت ئەزانی من و عەرەبانەو نۆکاویان وتووە، نەک دزیی و پیاو کوشتن.. بەڵام ئەگەر ئەتەوێ جومعان پاسەوانیت بکەم، ئەویش بەس تەنها تۆ، ملم لە موو باریکترەو خزمەتت ئەکەم.

شاموراد: ڕۆڵە من چیم تا پاسەوانم هەبێ؟ پێت وتراوە ئەو ئیشە بکەو ئەگەر ڕەت بکەیتەوە، ئەوە خۆت لە شوێنێکا سارد ئەکەنەوەو تیا ئەچی.. بەخوا خۆشم ئەوێی بۆیە ڕاستیەکەیم پێ وتی.

خدر٣: ئاخر قوربان کابرایەک نە ئەیناسم و نە ئەمناسێ، لەپای چی کەسێکی بۆ بکوژم کە نایناسم؟ ئاخر توخوا ئەمە قسەیە؟ هەر بۆ پارە؟ گەورەم من ئەوەندە پارە پەرست نیم وەک ئێوە تێی گەیشتوون.. هەیەو نییە هەر خۆمم و ئەم عەرەبانەیەش پڕ بە پێستی خۆمە.

شاموراد: وەڵاهی کوڕم دەستی ئێمەی تیا نییە، خۆی لێرەو لە ماڵیشەوە چاودێریی کردوویت و کورە ئەشزانێ کێ نۆکاو و پاقلەشت بۆ ئەکا! ئیتر ئەوەی لەسەرم بوو من گەیاندم، گەر بە تەنگ خۆتەوە نایەی ئەوە شتێکیترە.

خدر٣: کورە گەورەم ئەچمەوە دێکەی خۆم و خوا پارووە نانێک هەر ئەدا بیخۆم.. جا ئەگەر ئەو پاشایە خۆی بە پیاو ئەزانێ، با پێ بخاتە سنوری دێکەوە.. ئیتر ئەمە یەعنی چی یان پیاوم بۆ ئەکوژێ یان ئەیکوژم؟

شاموراد: کوڕم عینادی لەگەڵ مەکە، ئەو پیاوی زۆرە زۆر.

خدر٣ (( سەر بادان و کەمێک وەستان)): با بیرێکی لێ بکەمەوە گەورەم، سبەی دوا بڕیاری خۆمت ئەدەمێ.. ئەوەی ئەبێ بکوژرێ کێیە؟

شاموراد: ئەویش گەنجێکە بەدوای تۆڵەی براکەیا ئەگەڕێ، براکەی دز بوو لەگەڵ ئێمە پاشا دزیی پێ ئەکردین، کە خەریک بوو دەست پۆلیس بکەوێ بە بریندارییی، پاشا کەسێکی ناردبوو کوشتیان.. ئینجا ئێستا جەماعەتێکن، پاشا ئەیەوێ ئەو کوڕەو یەکێکیتریشیان بکوژرێ.

خدر٣: ئاخر ئەوە زوڵمە گەورەم.. وەک برای کوژراوە خۆی بۆ؟ جا وەک خۆت ئەڵێی، هیچ کەسێ دەستی بە پاشاکەش ناگا.

شاموراد: ئاخر نەگبەت گیان، خراپییەکە ئەوەیە هەرکەس بێنەوبەرە لەگەڵ پاشا بکا ئەکوژرێ و فەرمانی ئەبێ وەکو خۆی جێبەجێ بکرێ.

خدر٣: ئەشهەدوو چاکت ناونام، نەگبەت... یەعنی وەک تێئەگەم ئێوەش تووش بوون و گیرۆدەن بەدەست پاشاکەوە؟

شاموراد: ڕێک وایە، بچینە دەرەوە ئەکوژرێین، تا ئێستا دووانی لە خۆمان کوشتووە.

خدر٣: ئەی بۆ پۆلیس ئاگادار نەکەینەوە؟

شاموراد: کێشەکە ئەوەیە کەس شوێنی نازانێ بەمنیشەوە، کە بە چاوبەسراویی ئەبرێم بۆلای و بە شەویش.. وریابە، باوەڕ بکە هەر لە پۆلیس نزیک بکەویتەوە هەواڵی پێ ئەگاو بە خۆت نازانی کوژراوی.. ئیتر کەیفی خۆتە.

خدر٣: با بزانین تا بەیانی ئەقڵم چی ئەڵێ؟ با بچمەوە بەلای قوربەسەرییەکەی خۆمەوە.

(( خدر٣ ئەچێتەوە بۆ نۆکاوەکەو ئدریس ئەگەڕێتەوە بۆ دوکان))

Cut

دیمەنی – ٦٣٧ – ڕ- ش/ماڵی بروسک:

(( زوبێرو بروسک و ڕێژوان و سەلواو چیمەن تەواو سکی بەرز بووەتەوەو نارەوەن و ئامۆو ئاواو هەڵشۆو تیرۆژو تافان و هەندرێن و باڵاو کڵپە لە دیمەنەکەدا هەن))

زوبێر: بەڵێ، خوا هەڵناگرێ هەر ئەتوت باوک و برای خۆیان لە زیندانایە، زۆر بە خێرایی تا عەسر هەموو نوسراوەکان تەواو کران و برانە وەزەراتە و کورە چوزانم یەک دنیا گێرەو کێشەی تیا بوو، هەموویان تەواو کردو دەرگایان بۆ خستینە سەرپشت.

هەڵشۆ: هەموو بەربوون؟

زوبێر: تەنها ئەوانە نەبێ بە ماددەی هۆشبەرو تیرۆر زیندانی کرابوون، ئیتر ئەو باقیەکەی سەرپاکی ئازاد کرا.

نارەوەن: بەڕاستی دادپەروەریی تیایە.. چونکە ئەو دووە ڕاستەوخۆ زیان بە مناڵی هەموومان ئەگەیەنن.

زوبێر: ئەی تیرۆریست ڕاستەخۆ مەترسیە بۆ سەر ژیان و تلیاکچییش بە کاوەخۆ نەوەکانمان ئەکوژن.

ئاوا: وەڵا هەقبوو هەموویان وەک باوکم لە سێدارە بدرێن و کەسی تیا نەمایە، دەی ئەگەر بێنەوە دەرەوە چی؟ یەعنی ئیتر ناچنەوە بەلایا؟

زوبێر: لێبوردنەکە ئەو گروپی تلیاکچییە ناگرێتەوە، بەڵام لێخۆشبوونەکەی ئێوەش نەبووایە، منیشی نەئەگرتەوە، ئەبووایە چەند ساڵێکیتریش تیابوومایە.. من ئەوەم بیر ناچێ، سوپاسی گەورەییتان ئەکەم.

نارەوەن: هەڵەیەک بوو ڕوویدا، با ئەو پەڕەیە هەڵنەدەینەوە، داخراو بڕایەوە.

زوبێر: نا نا نارەوەن، بە دڵی پاکی خۆت مەڕوانە، ئەوەتا لەناو هەمووواندا بەس تریفە دیار نییە، دیارە بە زۆر ئیمزای لێخۆشبوونەکەتان پێکردبێ؟

هەڵشۆ: نا کاک زوبێر قەت وا مەڵێ، تریفە بە دڵ لێتخۆش بووەو هیچ شتێکی لە دڵا نەماوە.. بەڵام ئەمشەو هاوڕێیەکی لە دەرەوە هاتۆتەوەو هەر ئەمشەویشی ماوە لێرە بێ.. پێکەوە پیاسەیەک ئەکەن و نانێ ئەخۆن و ڕەنگە فریاش بکەوێ، بێت بۆ ئێرە.

زوبێر: دەی ئەوە ئیتر من ئاسوودە بووم، خۆشحاڵم هیچ گرێیەک نەماوە.. چونکە بەڕاستی نیازم وایە لەگەڵ ئێوەیا دەست بکەمەوە بە ئیش.. هیچ شتێکم لێ قەدەغە نەکراوە لە ڕووی یاساییەوە.. تەنانەت وەک پێشینەی تاوانیش پاک بوومەتەوە، هەر ڕێک وەکو پێش گرتنەکەم، چونکە هەم وەک هەقی شەخسی و هەم وەک گشتیی لێمخۆش بوون.

ئامۆ: ئەوە دەسکەوتە قوربان.

(( پێکەنین و دایالۆگیتر لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ٦٣٨ – ش/ د – دەرگای ماڵی تریفە:

Mute

(( دووکەسی دەمو چاو هەڵپێکراو، دەرگای سەرەکیی ماڵی تریفە ئەکەنەوە، یان ئەگەر خانووەکە حەوشەی هەبوو، خۆیان هەڵئەدەنە ناو حەوشەکەوەو دەرگای سەرەکیی ماڵەکە بە کلیلێک لەناو جێگەی پێڵاوەکەداو بە تایبەت لەناو پێڵاوێکدا دەرئەهێنن و دەرگاکە ئەکەنەوە))

———— تابع ———————————— Cut ————————————

دیمەنی – ٦٣٩ – متبوع – ش/ن - ماڵی تریفە:

(( تریفە تەماشای تەلەفزیۆن ئەکاو یاری مۆبایل، سەرەتا دەرگا ئەکرێتەوە وا ئەزانێ هەڵشۆیەو پاش کەمێکی کورت وەک ئەوەی یارییە ڕابگرێ))

تریفە (( بەدەم یارییەکەوە)): هاتیەوە؟ (( چاو هەڵئەبڕێت و دووانە بە دەماکی تەواوەوە ئەبینێ.. ئەقیژێنێ، دزێکیان ئەگاتە سەری و توند دەمی ئەگرێ و چەقۆی لێ بەرز ئەکاتەوە))

# (( ئەڵقەی سی و یەک))

دز١: یەک کەس بێ بەهاناتەوە، پێش هەموو کەسێک تۆ ئەکوژرێ، لەبەر ئەوە هیچ هەوڵێک نەدەی.. ئاقڵبەو پێمان بڵێ، پارەی فرۆشتنی قاوەخانەکەت لە کوێ داناوە؟ ئەگینا سکت بەم چەقۆیە ڕائەیەم. (( تریفە کە هەر دەست لەسەر دەمیەتی ئامازەی قەنەفەیەکیان ئەکا))

دز٢: دە تۆ دەمی بەردە، بزانین لە کوێیە.

دز١: دەنگت لێدەربێ کوژراوی.(( دەمی بەر ئەدا))

تریفە (( تۆقین و شڵەژاویی زۆر)): ئەوەتا لە چەکمەجەی ئەو قەنەفەیەدا، لەژێر بەتانییەکەوە.

دز٢ (( ئەچێت چەکمەجە ئەکاتەوەو لەژێر بەتانییەکە پارەیەکی زۆر بە دۆلار دەرئەهێنێ و بە دووجار بە پەلە ئەیکاتە گیرفانی شەرواڵەکەیەوە)): ئافەرین دادە گیان، ماڵتان ئاوابێ.. یاخوا هەر بە ساحێب پارەبن.

دز١: سوپاس کچە جوانەکە.. خواحافیز.. وا نەکەی بۆت بگەڕێینەوە.

تریفە: بەڵێ باش، بەسەرچاو.

دز۲: دەرگاکە بە کلیل دائەخەین، نەک ئەمە دنیایە دزێ، پیاو خراپێ بێتە سەرت.. بۆت بخەینەوە جێیەکەی خۆی؟ ناو پێڵاوەکە؟

تریفە(( تف قووت ئەداتەوەو بەسەر ئاماژەی بەڵێ ئەکا، دواتر)): بەڵێ بەڵێ! سوپاس.

(( دزەکان ئەڕۆن و تریفە بە پەلە تێل ئەکا))

تریفە: دایکە گیان فریامکەوە دز هاتنە سەرم و هەرچیم هەیەو نییە، هەموویان برد.

ـــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٦٤٠ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٣٧ – ش/ن – ماڵی بروسک:

(( وەک دیمەنی پێشوو دانیشتوون، نارەوەن تێل ئەکا ))

نارەوەن(( بە حەماسەوە )): وا کچەکە مرد، با بچین فریایکەوین... دایکت بمرێ یاخوا.

هەڵشۆ: ئای خوایە گیان، تریفەکەم! چی بووە؟ نەخۆشە؟

نارەوەن: دز چۆتە سەری دز.

زوبێر: منیش دێم بوەستن!

ئاوا (( بەدەم ڕۆشتنەوە )): تۆ لای میوانەکان دانیشە مامە زوبێر، تازە شتەکە ڕوویداوە.

زوبێر: بابە میوانی چی هەموو خۆیین.

هەندرێن: ئێمەش دێین کاکە نەک شتێ پێویست بێ.

(( تەنها سەلواو تافان و چیمەن و باڵاو کڵپە ئەمێننەوەو ئەوانیتر هەموو ئەڕۆن ))

Cut

دیمەنی – ٦٤١ – ش/ د – قاوەخانەیەک:

(( شەنیا، دەستی خستۆتە ژێر چەنەی و دەوران خەریکی مۆبایلە.. دانیشتوون))

شەنیا: ئەرێ ئەوە چیتە قسەیەک ناکەی؟!!!

دەوران: خەریکی ئەو ڕاپۆرتەم لەسەر تلیاک، ئای چەند مەترسیدارە خوایە.

شەنیا (( بیرکردنەوەی کەم)): ئەڵێ چی؟ بۆ منیشی باسکە.

دەوران: بۆت ئەنێرم.

شەنیا: جا من تاقەتی ئەوەم لە کوێ بوو، تۆش قسەی سەیر ئەکەی!

دەوران: دە بوەستە با تەواویکەم، تەممەڵی تەوەزەل. (( ئەخوێنێتەوەو جاروبار لەبەر خۆیەوە)) واو واو ئەوە چییە؟

شەنیا (( پاش ماوەیەک، کە دیقەتی دەوران ئەدا)): ئەرێ ئەوە پێنەگەیی؟!

دەوران: ئەوەی لەسەر کۆکایینە ئەڵێ ساڵی ١٨٥٩ دکتۆرێک بە ناوی ئەلبێرت نیمانەوە لە داری کۆکا دۆزیویەتییەوە.. دوای ئەوە تا ساڵی ١٩٠٣ لە گیراوەی کۆکاکۆلادا بەکارهاتووە.. لە ئەمەریکا تا ساڵی ١٩١٢، ٥٠٠ کەس پێی مردوون، بە کۆکایین.

شەنیا: وایە بیستوومە ئەڵێن کاریگەریی خراپی زۆرەو خەڵک زوو ئەکوژێ.

دەوران: ئەوەتا ئەڵێ کاریگەرێتیی زۆر خراپی لەسەر دڵ و مێشک و گورچیلەو سییەکان و هەوەسی سێکس و غودە هەیەو ئەبێتە هۆی پەکخستنیان.. مرۆڤ توشی دڵەڕاوکێ و خەمۆکیی ئەکا.

شەنیا: ئەی چۆنە وا بەربڵاوە لە جیهانا؟

دەوران: ئەڵێ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەشی لەناو بردنی مادەی هۆشبەرو تاوان هەیە ناوی (( unodc))یە.. ئەوەنیە لەم وڵاتانەش سزای لەسێدارەدانیان بۆ بازرگانیی کردن بەو ماددەیەوە داناوە؟

شەنیا: بۆ هەر کۆکاییینە؟ من حەشیشەو ئەوانەشم بیستووە.

دەوران: نا نا، ئەمەش هەندێ جۆریتریەتی، وەک بانگۆو ئێکستاسی کە حەبەو خراپترینیانە، هیرۆیین و ئەفیون و حەشیش و کریستاڵ و هەر زۆر زۆریتر نوسراوە.

شەنیا: دیارە داهاتی باشی هەیەو پارەی چاک پەیا ئەکا؟! هەهە.

دەوران: ئەی تەبعەن ئەگەر وا نەبێ ٣٠٠ ڕێکخراوی مافیایی تەنها لە کۆڵۆمبیا بۆ دروست نابێ.. چ جای لەم وڵاتانەی ئەم ناوچەیەو تا بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش بچی.

شەنیا: مادام خێری زۆرە، ئەڵێی چی خۆمانی تێ فرێدەین؟

دەوران: جا خۆ بەخوا لەدەستت دێ ئەوەش بکەی، خوام لەو خوایەی جارێکیتر هەر بەخەیاڵیش بیری لێ بکەیتەوە.. ڕۆڵە ئەم ژەهرە تا ئێستا لە جیهاندا ٢٥٠ ملیۆن کەسی ئالوودە کردووە.. ئەزانی یەعنی چی؟

شەنیا: یەۆنی ٢٥٠ ملیۆن کەس بەرەو گۆڕ هههە..جا خۆ من و تۆ ئالوودە نابین؟ ئێمە بۆ ئەو دەبەنگانەی پەیا ئەکەین، کە حەزیان لە مردنی سەرجێگەو زەلیلیە.

دەوران: شەنیا حوەسەڵەم بهێڵە، من چۆن ئەبمە باعیسی ژیانی خەڵکی تر.. دڵنیابە ئەوە کاری سیستمێکە بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی، کاری من نییە.

Cut

دیمەنی – ٦٤٢ – ش/ د – بەردەمی ئوتێلەکەی گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆ دێنە دەرەوەی ئوتێلەکە))

ئاکۆ: ئەمە دووجارە نانتان ئەخۆم، بەڕاستی بەلەزەتە!

گێلاس: ئەی چۆن؟ خۆ بۆ ڕیستۆرانتی لاکۆلان نەچووی.. تۆ لە ڕیستۆرانتی شاژن نانت خواردووە.. باش نەبوو بەهۆی دەعوەتی ئاواشەوە هاتی؟

ئاکۆ: جا ئەوە کەی دەعوەتە کە خۆی لەوێ نەبێ؟

گێلاس: گرنگ ئەوەیە هات بۆ دوکان بەدواتاو پێشی وتی ئەگەر خۆشم لەوێ نەبووم، ئێوارە دەعوەتی لە ئوتێلەکە.

ئاکۆ: دەی لە دۆڕاو بەزیاد بێ.

گێلاس: کورە دۆڕاوی چی؟ خۆی بە یەکەمین براوەی سەر زەوی ئەزانێ کە نینا ئاشتی کردۆتەوە.. جا وەرە ڕازیی بێ و شووی پێ بکا، ئۆی ئۆی ئەبێ چی بکا؟

ئاکۆ: جا نینا لە ئاوا باشتری دەست ئەکەوێ؟

گێلاس: نەڵێم برازای خۆمەو وەسفی ئەکەم، بەڵام شایانی باشترینی ئەم وڵاتەیە، زۆر جوان و تێگەیشتووەو بێ کێشەیە بێ کێشە، ئەوە باشە لەگەڵ هەموو کەسێکا هەڵئەکا، حەزی لە ئیشەو.......

ئاکۆ(( قسەی پێ ئەبڕێ و بە سوعبەتەوە)): دەی کەم هەڵیکێشە، یاخوا تۆ کەسێ وەسف نەکەی هههههە.

گێلاس: دە بڵێ وا نییە؟

ئاکۆ: تۆ ڕیستۆرانتەکەم پێ نیشانبە، ئەویش لەمناوەیە؟ یان بە سەیارەکە بچین؟

گێلاس: وەرە سەرکەوە، جادەی ئەودیوە، با بڕۆین.

ئاکۆ: پارەی کڕینی شوێنەکەت تەواوە؟

گێلاس: زیادیشی هەیە.. بۆ تۆ من بە چی ئەزانی؟ ٣٠٠ هەزار دۆلارەکە لە سەیارەکەیایە، بەیانی ئەیدەین بە کابرا، ئەیچۆن؟

ئاکۆ: کچێ پارەیەکی وا زۆر چۆن ئەخرێتە سەیارەوە، ئەی هاوار؟

گێلاس: تۆ سەرکەوە.. کێ ئەزانی ئەو پارەیە لە سەیارەکەدایە لە تۆو نینا زیاتر، متمانەم بە ئێوەش نەبێ؟

ئاکۆ: نەوەڵا بە کەست نەبێ.

(( سواری سەیارەی گێلاس ئەبن.))

Cut

دیمەنی – ٦٤٣ – ش/د – باخی ماڵێ شۆڕش:

(( نیناو شۆڕش دانیشتوون))

نینا: ئەمەوێ تەواو هەڵیسەنگێنم باوکە.. خۆ من بۆ ڕۆژو دوو ڕۆژ شوو ناکەم.. ئەی نابێ بزانم کە زۆر توورە بێ و دڵی خۆش بێ چی ئەکا؟ دەروون ڕەشیی مەترسیدارترین ڕەوشتی مرۆڤە، تا ماوەیەکیش تێنەپەڕێ ئەوە دەرناکەوێ، خەڵک ئەتوانێ بۆ ماوەیەک دەروونڕەشیی خۆی چاک داپۆشێ بەس تاسەر نییە.

شۆڕش: ئافەرین.. گوێ مەدەرە ئەوەی سەیری کچان ئەکا یان نا.. هەموو کەسێک جوانیی خۆش ئەوێ.

نینا: لەبری ئەوە باوکە، من بە ماوەیەکی باش تێ ئەگەم، کە خۆشی ئەوێم، یان مەبەستی ژنهێنانەو هێچیتر.. بزانم چەند ڕێزی بۆچوونی ژن ئەگرێ؟ چەند بە تەنگ دروستکردنی ماڵەوەیە.. ئەگەر کەسوکاری خۆی یان منی لا بەبایەختر بوو، یەعنی خراپترینە.. ئەبێ بە باوەڕی زۆرەوە وەک یەک سەیریان بکا..

شۆڕش: شتێکی زۆر گرنگ هەیە.. بزانە کە کێشەیەک ڕووی تێ ئەکا چۆن ئەیبینێ؟ ئایا گەورەی ئەکاتەوە یان بچووک.. چونکە کێشە بە پێی جۆرەکەی ئەگۆڕێ.. کێشە هەیە ئەبێ دوایخەی، هەیە پێشیخەی، هەیە ئاڵۆزیکەی، گەورەیکەی، بچوکیکەی، ڕێکیخەی، پەلەی تیاکەی، درێژخایەنیکەی، لە کورتیدەی، هەیە ئەبێ فەرامۆشیکەیت و هەشە ئەبێ ئاراستەی بگۆڕی.

نینا: سوپاس باوکە وا ئەکەم.. ئیتر دوو کەسی جیاواز بە هەموو بارە دەروونییە جیاوازەکانیانەوە پێکەوە ئەژین.. جا یان لە زۆردا هاوبەشن.. یان ئەبێ لەسەر تەواوی ڕێککەون، مەگەر هەندێ شتی وردی تایبەت بە ژن و پیاو نەبێ.. یان ئەوەتا دووربکەونەوە باشترە.. تکایە ڕێم لێمەگرە باوکە، با ماوەیەک هەر هاوڕێ بین.

شۆڕش: هەروا نەبێ ببنە بنێشتە خۆشکەی ژێر دانی خەڵکی بێویژدان، ئیتر من ڕێم لە چیت گرتووە؟

(( لە دەرگا ئەدرێت و نینا ئەچێ ئەیکاتەوە))

نینا: باوکە مامە سەردارە.

(( بەخێرهاتن و نینا ئەچێتە ژوورەوە، سەردار لە دواوە دیقەتی ئەدا، لەگەڵ شۆڕشا سەردار سڵاو و وەڵام))

سەردار: ماشەڵڵای لێ بێ، زۆر گەورەو جوان بووە.

شۆڕش: ئیتر وەک کچی خۆتە سەردار گیان، مامی وا بڵێ گرنگە هههە.

سەردار: ئەرێ تۆ هەواڵی خوشکتم پێ بڵێ، ئەیبینم زۆر مشەوەش دیارە.

شۆڕش: ئەوە ئێستا نینا بۆی باسکردم، بەیانی ئەچێ چێشتخانەیەک ئەکڕێ، بە ٣٠٠ هەزار دۆلار، بە شوێنەکەشیەوە.

سەردار: جا ئەو هەموو پارەیەی لە کوێ بوو؟

شۆڕش: خەمی گێلاست نەبێ هەیەتی.

سەردار: وەڵڵاهی ئەبووایە ئەوە ئێمە بیخۆین، ژنێکی داماوی وا چوزانێ ئەو هەموو پارەیە بژمێرێ، ئینجا بشیخوا ئۆوهووو!

شۆڕش: بەخوا ئیتر من چاوم لەدوای پارەی کەس نییە، حەیام بێ بەسمە.

سەردار: وا تۆ نایەیتە سەر ڕێم، چی بکەم، خەریکە کارم تێ بکەیت و بێمە سەر ڕێگەت.. هەرچەند بیر ئەکەمەوە هەست ئەکەم ئیشەکەم ئابڕووچوونی زۆر تیایە، حەزم لێی نەماوە.. کورە تۆ چۆن بی، منیش هەروام مامە شۆڕش گیان.

(( لە میوتیدا حوار))

Cut

دیمەنی – ٦٤٤ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٣٩ –ماڵی تریفە:

(( زوبێرو نارەوەن و ئامۆو ئاواو هەڵشۆو ڕێژوان و بروسک و هەندرێن و تیرۆژ و تریفە لە دیمەنەکەدان.. ئەفسەرێک و پۆلیسێک یان دووانیش لە ژوورەوەن))

ئەفسەر: باشە ئەتوانن سبەی بێن بۆ بنکەی خۆمان و داوا تۆمار بکەن.

زوبێر: داوا دژی کێ جەنابی ئەفسەر؟ کە دزەکان دەم و چاویان هەڵپێکابێ و نەناسراو بن؟

ئەفسەر: ئێمە دژی نادیار داواکە وەرئەگرین و ئەو ڕۆژەی کە ئەگیرێن، ئەم داوایانەیان لەسەر کەڵەکە ئەبێ.

هەڵشۆ: زۆر سوپاس قوربان.. سبەی دێین.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی ئەفسەرو پۆلیس))

ئامۆ: باشە بهاتیایە بۆ ماڵی مامە زوبێر لەگەڵ هەڵشۆدا باشتر نەبوو؟ ئاوا نەشئەترسای؟

تریفە: ئێ خۆ پێی نەوتووم بۆ ئەوێ ئەچم.. بۆ هیچ شوێنێک پێم نالێ.

نارەوەن(( بۆ هەڵشۆ)): کورە ئەی تۆ نەتوت پێموتووە نەیتوانی میوانی هەبوو؟

هەڵشۆ: نا.. ڕاستیەکەی وتم نەک مامە زوبێر دڵی شتێک بکا.

زوبێر: بۆ کوڕم، گەر بتوتایە بەوم نەوتووەو هەر خۆم هاتووم، دڵم شتی ئەکرد؟

ئاوا (( بەسوک سەیرکردنی هەڵشۆ)): تریفە دڵی پاکەو هیچی بۆ دروست مەکە، ئەو مامەزوبێری هەر خۆش ویستووە.

تریفە: ئەرەوەڵا موحیبەتی بەقەدەر باوکم لە دڵمایە.

زوبێر: خوا لە گوناهی باوکت خۆش بێ کچم.. باوەڕکە ئێوەش لە دڵما زۆر شیرینن، ئەوەشی کە ڕوویدا، کاردانەوەی هەڵەی من بوو، بە خۆشحاڵییەوە هیچ ڕوویندا، ئەگینا من خۆم ئەکوشت.

نارەوەن: چۆن هاتنە ژوورەوە؟ خۆت دەرگات لێکردنەوە؟

تریفە: نەوەڵا کاتێکم زانی دەرگا کرایەوەو دوو دەمامکدار هاتنە ژوورەوە.

هەڵشۆ: ڕەنگە شوێنی کلیلەانیان لە پێڵاوەکانا زانیبێ، چونکە ئێمە هەر لەوێ کلیل دائەنێین.

بروسک: باشە ئەو دزانە چۆن زانیان کلیل لە پێڵاوا بۆ یەکتر دائەنێن؟

تریفە: وەڵا نازانم.. جاروبار هەڵشۆ ئەڵێ لە قسەوباسا خەڵک هەروا ئەکاو منیش وتوومە هەروا ئەکەم.

ئاوا: یەعنی ئێوە لە کۆڵان ئەژین، دەرک و بانتان نییە؟

هەڵشۆ: ڕاستیەکەی من بە چەند برادەرێکم وتووە کە هاتن بۆماڵمان کلیل لەوێ دائەنێین.

ئامۆ: یەعنی تۆ ژنێکی جوان و ناسک لە ماڵەوە جێ ئەهێڵیت و جێ کلیلیش ئەدەی بە هەتیو و مەتیوی خوێڕی؟ (( ئامۆ ئەیەوێ بۆی بچێ، ڕێژوان ڕایئەگرێ))

ــــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ــــــــــــ Cut ــــــــــــ

دیمەنی – ٦٤٥ – ش/ د – خانوە تازەکەی خدر:

Mute

(( کۆمەڵێک گەنج بە جلی کوردییەوە، دوو خێمە بەرامبەر یان لە تەنیشتی خانوەکەی خدرەوە هەڵئەدەن))

Cut

دیمەنی – ٦٤٦ – ش/ن – ماڵی نیگار:

(( نیگار گوێ هەڵئەخاو ئەچێتە نزیکی دەرگای مەدخەل.. دەوران ئەبینێ ئەگەڕێتەوە))

نیگار: دەوران دواکەوتی!

دەوران: بڵێم چی نیگە گیانەکەم؟ شەنیا دوای خستم.. ویستم بیبەمەوە، لە ڕێگە بالەیەکی بینی و تا دوو پارچە جلی هەڵگرت دە جار پێم وتووە شەنە درەنگمە دایکم دڵی لامە.

نیگار: شەوێکیتر لێی قبوڵ مەکە باوانم، ناکرێ، دنیاکەی پڕە لە پیاو خراپ.

دەوران: بەسەرچاو، دوا شەوم بێ ئەوەی لێ قبوڵکەم، وا بکاتەوە جێی ئەهێڵم.

نیگار(( پاش کەمێک)): پێویستیمان بە کچێکی وریایە دەوران گیان، بەڵکو بە یەکێ لە هاوڕێکانت بڵێی.. بزانە کامیان گورج و گۆڵترو وریاترە.

دەوران: جا کێ لە شەنیا وریاترە دایکە.

نیگار: ئەی نەیوت ئیشم دەستکەوتووە؟

دەوران: وایە: حەتمەن لای تۆی پێ باشتر ئەبێ، بزانم واز لە ئیشەکەی ناهێنێ؟ هەرچەند جارێ لەوێ تازەیە باوەڕ ناکەم.

نیگار: دەی بزانە یەکێکیتریان.

Cut

دیمەنی – ٦٤٧ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٤٤ – ماڵی هەڵشۆ:

ئاوا: درۆ ئەکا، جێ کلیلی نەداوە بە کەس.. تریفەی لە ماڵەوە جێهێشتووەو خۆی هاتۆتە ناو ئێمەوە کە بمانکا بە شایەت ئەو دزییەکەی نەکردووە، لەولاشەوە سەرسەرییەکانی ڕەفیقی ڕاسپاردووەو جێ کلیلەکەی پێ وتوون.. ئەوە من ئەیناسم من.

ئامۆ: هەردووکی بەڵگەی ئەوەیە ئەم خوێڕییە خۆی دزییەکەی کردووە.

هەڵشۆ: باوەڕ بکەن من ئاگام لە هیچ شتێک نییە، ڕەنگە دزەکان خۆیان گەڕابن و کلیلیان دۆزیبێتەوە.. ئاخر چۆن خەڵک دزیی لە ماڵی خۆی ئەکا؟ لە هەزار دادگا ئەیسەلمێنم من لەگەڵ خۆتانا بووم کاتی دزییەکە، ئێوەش بیسەلمێنن کە خۆم دزیم لە ماڵی خۆم کردووە.

ئاوا: فلّتە فلّت هەتیو، من ئەزانم چەند سوك و خوێریی و هیچ و پووچی، بۆیە ویستم تریفەت لێ بسێنمەوە.. من گوێم لە پارەکە نییە هەرچەندێکە دزراوەو تەواو.. خەمی خوشکەکەی خۆممە کە توشی ترس و تۆقینت کردووەو لە بەردەستی سەرسەریی وەک تۆدایە.. دەی وا ئەو هەتیوانە لە خۆت خوێڕیتر دەرچوونایەو هەڵەیەکیان بکردایە.. بە قەبری باوکم دەمودەست ئەمکوشتی ناپیاو.

نارەوەن: هەستە تریفە پێشمانکەوە بۆ ماڵەوە، ئەمە پیاوی ئەوە نییە لە ماڵەکەیدا بژیت.. ئەمە ماڵی تۆ نییە هەستە.

هەڵشۆ: تکاتان لێ ئەکەم، لێتان ئەپاڕێمەوە مەیگەیەننە لێک دابڕانمان، ئێمە یەکترمان خۆش ئەوێ و نامانەوێ جیابینەوە.. تکایە دەرفەتێکم بدەنێ، با تەواوی ژیانمان بەیەکەوە بین.. پارە تۆزوبایە، لە هیچ شوێنێک ناگیرسێتەوە، من بەڵێنتان ئەدەمێ ئیشی باش بکەم و ئەو پارەیەو بە زیادیشەوە پەیای بکەمەوە.

زوبێر: دەی کەوابێ ئەو دەرفەتەی بدەنێ کوڕم.

ئاوا: بۆ خوێڕی، تۆ وا ئەزانی من مەبەستم پارەیە.. من ئەمەوێ خوشکەکەم تینەچێ بەهۆی تۆوە.

نارەوەن: هەستە کچم، با دوانەکەوین.

زوبێر: پرسیارێ بە کچەکەش بکەن باشترە، ڕای خۆشی بزانن.

هەڵشۆ: مامە زوبێر ڕاست ئەکا، ئەها ئەڵێ چی؟!

بروسک: تۆش قسەیەک بکە تریفەخان.

ڕێژوان: لەسەر قسەی تۆ وەستاون. ڕاست ئەکا شتێ بڵێ.

تریفە(( کەمێک بێدەنگیی)): منیش ئەڵێم با دەرفەتێکیتری بدەینێ.

ئاوا: ئەک عەمرت نەمێنێ، خەتای ئێمەیە خۆمان لەسەر تۆ سەغڵەت کردووە.

(( ئاوا ئەچێ بەرەو دەرگاو ئامۆش هەڵئەسێت و خواحافیزیی ناکات))

نارەوەن: کەیفی خۆتە.

(( ئەوانیتریش خواحافیزیی لە هەڵشۆو تریفە ئەکەن، جگە لە نارەوەن و تیرۆژ کە خواحافیزیی لە هەڵشۆ ناکەن))

Cut

دیمەنی – ٦٤٨ – ڕ/ د – خانوە تازەکەی خدر:

(( کۆمەڵێک کەس بە جلی کوردییەوە لە دەوری خدر٣ کۆبوونەتەوە.. خدر قسەیان بۆ ئەکا ))

خدر٣: لەسەر سیلەی هەر کۆلانێک سێ کەس بوەستێ.. ڕێ لە هەر سەیارەیەک بگرن، گەر جموجولێکی بە جۆرێکی کرد، یان خۆم ئاماژەتان بدەمێ.. ئەوانیتر لە دەوروبەری خۆم بن، بەردەمی هیچ دوکانێک ناگرن، با خەڵکەکە بێزار نەبن.. تەماشای هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش ناکەن پەیوەندیی بە خۆمانەوە نەبێ.. بە کۆمەڵ ناوەستن و نابێ لە دوو کەستان زیاتر پێکەوە بوەستن و ماوەشتان لە نێواندا هەبێ.

هەموو: بەسەرچاو.

خدر٣: دەی سواری سەیارەکان بن و هەموو چاوەڕێی ئاماژەی من ئەکەن بۆ هەموو شتێک.

(( سواری سەیارەو دەبڵەکان ئەبن و ٤ سەیارە دەرئەچن ))

Cut

دیمەنی – ٦٤٩ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( لەتیف پیاوێکی تەمەن سەروو ٥٥ ساڵ جلی کوردیی ڕێکپۆش وەستاوەو ئاوا دێت بۆ کۆمپانیا ))

لەتیف(( گورج ئەبێتەوە )): بەخێر بێی کاک ئاوا گیان.

ئاوا(( وەک بیەوێ بچێتە ژوورەوەو سەرپێیان قسە بکا )): سوپاس مام لەتیف، گوێبگرە.

لەتیف: ئەمرکە قوربان؟!

ئاوا: بارێکی خوری دێت و دائەگیرێ و بە لۆرییەکانی خۆمان ئەینێرینەوە بۆ دەرەوەی شار.. ئەمەوێ زۆر بە وردیی ئەمەیان بپشکنی، جیاواز لەوانیتر، باشە مامە گیان؟

لەتیف: خەمت نەبێ کاکە ئاوا گیان، شیتاڵ شیتاڵی ئەکەم.

ئاوا: هەمووی کەپس کراوە، تۆ هەڵیوەشێنە، من ئەو مەرجەم بۆ داناون.

لەتیف: هیچ خەمت نەبێ قوربان گیان!

ئاوا: چاوەکەمیت. (( ئەچێتە ژوورەوە بۆ کۆمپانیا ))

Cut

دیمەنی – ٦٥٠ – ڕ/ د – عەرەبانەی نۆکاوەکەی خدر٣:

(( خدر٣ بەدیار عەرەبانەکەیەوە وەستاوەو دەنگی نییە، بیر ئەکاتەوە.. ئدریس لە پشتیەوە وەستاوە، کۆمەڵە هاوڕێکەشی تاک و لۆ بەوناوەدا بڵاو بوونەتەوەو سەر سیلەی هەردوو فەرعی سەروو و خواروو، سێ کەس سێ کەس وەستاون ))

ئدریس(( تۆزێک لێی دێتە پێشەوە)): چییە برا ئەڵێی نۆکاوەکەت سووتاوە، وا قاو و قیژەکەی ڕۆژانت نییە؟

خدر٣(( ئاهـ هەڵکێشان و هەر پشتی لە ئدریسە)): کاشکای نۆک و پاقلەشم بسوتایەو ملیشم بشکایەو دەست و قاچێکیشم دابنایە، بەس ئێوەم نەناسییایەو نەهاتمایەتە بەردوکانتان!

ئدریش (( قاقا)): بۆ خراپیمان چییە برا؟ هههە ئیشمان بۆ دۆزیویتەوە ئەمما ئیش!

خدر٣: کورە نەفرەت لە خۆتان و پاشاکەتان و ئیشەکەشتان.. بابە من ئەهلی کەسابەتم، چیمداوە لەو بەزمەی ئێوە؟ (( ئاوڕ ئەداتەوە بۆ ئدریس)) ئەگەر ئەم سەرەتان بە بڕین نەدام قسە بکە.

ئدریس (( دێتە بەردەمی)): بە شەرەفم لەسەر ئەو قسەیەت پاشا ئامادە ملت هەڵکێشێ.. هەتیو بۆ ئەوەندە بێ ئەقڵی، ڕەنگە کەسانێک بەلاتا بڕۆن و تۆ ئاسایی وەریگری، بابزانی چەندین کەس لە ناویانا، پیاوی پاشایە.

خدر٣: ئەک زیڕەکەی لە پاشا.. دەی سا بیللاهی من حسابی ئاغزە جگەرەیەکی بۆ ناکەم.(( شاموراد دێت و ئەیەوێ بچێتە دوکانەوە)) ئاوەرە شاموراد!

ئدریس: هەتیو جوان قسە بکە، بڵێ گەورەم.

خدر٣: با نەماڵم بە لەوستا بچۆرە دواوە، تۆ هەر بێغیرەتترین کەسی (( تووڕە)) بڕۆ دواوە دەی.

شاموراد: ئەوە چییە سمکۆ بۆ وا هار بوویت؟

خدر٣(( سەری لێ ئەباتە پێشەوە )): کاک سمکۆ! تێگەیشتی ناشاموراد.

شاموراد(( تورە ئەبێ )): ئەوە بێ شەرەف وتت چی؟ ئدریس!

خدر٣: قەبری بابی خۆت و ئدریسیش.. ناپیاوانە، لە خوێڕیەکی پیاوکوژ ئەترسن و ناوتان ناوە پاشا.. من ئەبێ ئەو پێڵاوانەی خۆمی پێ بلێسمەوە باشە؟.. ئەوسا حسابێکیش بۆ ئێوە ئەکەم.

شاموراد: تۆ تۆزێ هێمن بەرەوە، وەرە دوکانەکەوە با کەس گوێی لێمان نەبێ.

خدر٣: من هەر لێرە قسە ئەکەم و منەتم بە هیچ سەگبابێکیش نییە سیخوڕیی بۆ بکا.

شاموراد: ئەویش ئەیەوێ ئەمشەو بتبینێ.

خدر٣: تەلەفونیت لایە.

شاموراد: بەڵێ کاک سمکۆ.

خدر٣: دەی پێی بڵێ کاک سمکۆ بە شەو نایەوێ کەس ببینێ، هەر کەسیش لێم نزیک بێتەوەو بەشەو بێ بە پەرێزما، ئەیکەم بە بێژنگ.. ئەگەر ئیشی زۆریشی پێمە، با بێ بۆ سەر عەرەبانەکە.

شاموراد: کاکە ئەو پاشایە.

خدر٣: ئەوەندەم خزم و کەسوکار بانگ کردووە، (( ئاماژەی کوڕەکان ئەکا )) ئەها ئەها چۆن وەستاون، خۆ ئەیانبینی؟.. جا نەک بەو پاشا فسفس پاڵەوانەت، کە بە تاکێ گۆرەویی قوڕاویشی نازانم. دەی واش بێتە سەرم ئەبینی کە هاتن چیان بەسەردێنم.

شاموراد: جا ئەو خزمانە تاسەر لەگەڵتا ئەبن؟

خدر٣: ئێرە ئەوەندە پەیا ئەکا، زۆر بە ئیسراحەت نان و ئاویان بدەم و ئەوە ئیشی تۆش نییە.. دەبڕۆ تەلەفونەکەی بۆ بکە... (( تووڕە )) بڕۆ دەی.

شاموراد: باشە بەسەرچاو گەورەم. ________________ Cut

دیمەنی – ٦٥١ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆ دانیشتووەو شەنیا دێتە ناودەرگاکە))

شەنیا(( بە نازەوە)): بەیانیت باش شاکوڕ!

ئامۆ (( هەر لە جێی خۆیەوە، کاغەزی لەبەردەستایە ئەینوسێ و سەر هەڵئەبڕێ)): ها شەنیا گیان بەیانیت باش.. وەرە دانیشە، ئەوەندەم نەماوە تەواویکەم، یەک دەقە.

شەنیا (( بەدەم هاتنە ژوورەوەوە)): بە کەڵکی بڵاوکردنەوە دێت؟ هەهە

ئامۆ: نا وردە حسابێکە.

شەنیا: دەی بە ئیسراحەتی خۆت.

ئامۆ(( پاش کەمێک)): تەواو.. هەموو شتێک لە جێی خۆیدایەو زۆر نایابە!

شەنیا: دەی ئێمەش ئەوەمان ئەوێ کارت باش بڕوا.

ئامۆ: سوپاس.. هەڕەشەکەت لەسەر نەما؟

شەنیا: نا سەرنوسەرەکەمان بە پۆزشێک چارەسەری کرد.

ئامۆ: پێمخۆشە.. باشە بۆ پێشنیازی ئیشێکت بۆ نەکەم؟

شەنیا: لای خۆت یان چی؟

ئامۆ: نا.. هەر ئیشێک بە دڵی خۆت بێ.. من ئەترسم تۆشم لە دەست بچێ!

شەنیا: جا من و تۆ چیمان لە نێواندایە؟ تا گرنگ بێ لە دەستت نەچم؟

ئامۆ(( پاڵدانەوە)): تۆ گرنگی بۆ من کچێ.. من ئەتوانم بەردەوام ئەو ببینمەوە.

شەنیا(( سوعبەت)): ئەترسم مرخت لێ خۆش کردبم هەتیو؟! ئیتر بە ناوی ئەوەوە هەڵمبخەڵەتێنی هەهە.

ئامۆ (( پێکەنین)): نا نا چاوەڕوانی ئەوەم لێمەکە.. ئەو بڕیارەی پێم وتووی کە هەرگیز هاوسەرگیریی ناکەم و خۆشەویستیی لەگەڵ هیچ کچێکا ناگۆڕمەوە، بەڕاستمە.

شەنیا: دەی کەواتە من گرنگ نیم بۆ تۆ.

ئامۆ: وتم زۆر گرنگی.. تەنها شێوەیەکی ئەوت تیایەو من ئاسوودە ئەکا، ئەگینا بە تەبیعەت و هەڵس و کەوت و بیرکردنەوە.. نا هەر زۆر دووریشن لەیەکەوە.

شەنیا: ئەزانی ئامۆ بێزار بووم؟

ئامۆ: لە چی بەقوربان؟

شەنیا: لە تۆ.. لە هەڵسوکەوتت.. لە قسەت.

ئامۆ: بۆ چاوەکەم خوانەخواست چی خراپم کردووە؟

شەنیا: دوو سێ مانگە ئەتناسم، هەموو ڕۆژێک لەبەرخاتری تۆ، ئیشم هەبێ یا نەبێ، ئەبێ سەردانێکی تۆ هەر بکەم.. کەچی تۆش بەردەوام ئەو، ئەو.. ئەرێ نەبڕایەوە؟ ئینجا ئەویش لە مندا ئەبینیتەوە وەک ڕوخسارو هیچیتر، خوا ئەزانێ کوێی لە من چووە؟.. بە راستیی ئەگەر ئاوا بەردەوام بیت، بە داوای لێبوردنەوە، ناتوانم بەردەوامیی بە هاوڕێیەتییەکەمان بدەم.. هەزار بابەتیتر هەیەو تۆ هەموو منت ئەوق کردووە لەودا.

ئامۆ: ڕاست ئەکەی.. بەڵام منیش بەدەست خۆم نییە ئەوم بیر ناچێتەوە.

شەنیا: نەخێر، تۆ ناتەوێت ئەوت بیر بچێتەوە، ئەگینا چاک ئەزانی ژیان بەردەوامەو ناکرێ لە سێ ساڵی ڕابردووا گڕیدەی.

ئامۆ: شەنیا گیان ئەوە ئەزانم، بەڵام شتێک هەیە لە دەسەڵاتی مندا نییە.

شەنیا: ئەویش ئەوەیە کە کەس ناتوانێ شوێنی ئەوت بۆ بگرێتەوە.

ئامۆ: نا بەڕاستیی تۆ لەو زۆر پێگەیشتووترو ڕاستتر جوانترو دەم و دووت خۆشترو جا چیتر نا؟.. بەڵام من تەنها ئاسوودەم بە تۆو هیچیتر، کەچی ئەو بە هەموو شتێکیەوە لە دڵمایە.

شەنیا: ئۆکەی.. منیش لەمڕۆوە باسی کوڕێکت بۆ ئەکەم کە ساڵانێک پەیوەندیمان هەبوو و زۆرم خۆشویست.

ئامۆ: ئەی ئێستا لە کوێیە؟

شەنیا: لە دەستم چوو.. چوو بۆ هەندەران.. یەکسەر ژنیشی هێنا.

ئامۆ(( پێکەنین)): ئەوە هەڵبەسراوە ڕۆڵە.. کەس نییە دوای پەیوەندییەک یەکسەر هاوسەرگیریی بکا، چونکە تێک ئەشکێ.

شەنیا: لە دڵی خۆتەوە مەڕوانە، خەڵکی داماوی وەک تۆ کەمن، کە خۆشەویستەکەی لەدەستچوو، ئیتر تەرکی دنیا بکا.

ئامۆ: واو یەعنی من ئەوەندە داماوانە ئەژیم؟

شەنیا: زۆر لەوەش زیاتر کە ئەیزانی.

ئامۆ: ئەی چی بکەم باشە؟ بۆ ئەوەی ئەوەندە داماو نەبم.

شەنیا(( هەڵئەسێ)): بگەڕێوە ناو ژیان.. بۆ نمونە ئەمڕۆ دەوامم نەبوو، بۆ ئەوە هاتم زۆر دانیشین و دواییش پێکەوە بچین نانێک بخۆین.. بەڵام داخراویەکەت دڵی گوشیم.. ئەچمەوە ماڵەوە ئەوێم باشترە، کەس دڵم سەغڵەت ناکا.

ئامۆ: دانیشە شەنیا گیان.. هەموو شتێک چاک ئەبێ.

شەنیا: ئەمڕۆ نا، تازە سەرودڵت گرتووم.. (( دڵی پڕ ئەبێ)) بە هەڵەش تێ نەگەی، من مەبەستم ئەوە نییە منت خۆش بوێ، تەنها ئەمەوێ تۆ باش بیت. بای (( بە پەلە ئەچێتە دەرەوە، چەند ئامۆ بانگی ئەکا، وەڵام ناداتەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٥٢ – ڕ/ن – ماڵی بروسک:

(( بروسک و زوبێر تاوڵە ئەکەن))

زوبێر: کەواتە ئێستا تۆ چوارت هەیەو من سێ.

بروسک: بەڵێ مامەگیان، بەخوا دیارە لەوێ باشیان فێر نەکردووی؟!

زوبێر: ئەی ئا ئەمە چییە؟ (( زارەکە هەڵئەدا))

بروسک: دووبارەیە.

زوبێر: مەبەستم ئەوە بوو بڵێم ئەمە مەرزە.. یەعنی براوەکە من بووم نەک تۆ.. حەزم لە هیچ شتێکی دووبارەش نییە بروسک، ئەوە بزانە.. بەردەوام نوێ خۆشترە.

بروسک: جا خۆ بەدەست من نییە.. بەڵام جارێ دیار نییە مەرزیش بێ، دووشەشێک هەموو شتێک ئەگۆڕێ.

زوبێر(( سەر بەرز ئەکاتەوە)): وایە بروسک گیان، شتێک کە دێتە پێشەوە هەموو شتەکانیتر ئەگۆڕێ.. من تا نەگیرابووم پڕ بووم لە هیوا، گەنج گەنج لە هەموو دەرگاکانی ژیانەوە ئەچوومە ژوورەوە.. من خۆم لە قەرەی خەونە گەورەکان ئەدا.. مەبەستم سەرمایە نییە، مەبەستم خەونە گەورەکانی ژیانە، بە دوای ئەوەوە بووم نهێنییەکانی بوون و نەبوون بدۆزمەوە.. زۆر کەڕەت خۆم لێ ئەبوو بە زیندەوەرێکی زۆر بچووک بەسەر شانی کێوێکەوە، بە بلٌقێکی ئاو لەسەر زەریایەکی بەرین، کەچی هەر ئەگەڕام، سرەوتم نەبوو..

بروسک: واو واو لەو بیرکردنەوە جوانە.

زوبێر: ئا خەریکە بیرم بێتەوە، بێزم لە ئایدیۆلۆژیاکان ئەهاتەوە، ئا لە هەموویان، هەستم ئەکرد جەنگەڵێکن بۆ چەوسانەوەی مرۆڤ، کە تۆ سەر بە ئایدیایەک بووی، ئیتر کۆت و پێوەندەکان ئامادەن لە فیکرت بئاڵێن و نەهێڵن واوەتر بچی.. ئا بیرمە بەردەوام لەسەر شەپۆلێک نەئەگیرسامەوە.. من من بووم نەک یەکێکیتر، بۆیە هیچ شتێک لای من جێگیر نەبوو، هیچ شتێک پیرۆز نەبوو، بەڵکو تەنها بایەخدار بوون

لەلام (( پێکەنین)) دوای بڕینی زۆرێک لە ساڵە شەل و کەللە پووتەکان، ئەوسا تێگەیشتم من هەر لە فامکردنمەوە جۆرێکیتر بیرم کردۆتەوە.. ئەزانی بروسک، هەر ئازاد بووم و هیچیتر.. تۆ ئەتوانی ئاوا بیر بکەیتەوەو سەر بە هیچیش نەبی.

بروسک: نا مامەگیان، ببورە من ناتوانم و نامەوێ ئاوا بیر بکەمەوە، من بۆ بیرکردنەوە نەخوڵقاوم.. من هەم و ئەژیم و ئەمرم و تەواو. هههە.. دەی با یارییەکە تەواوکەین، من لە دەرکەوتنەوەیام.

زوبێر: وایە، با یارییەکە تەواوکەین.. دواجار منیش ئەمرم و دارەوانیش هەر مردووەو سەدان باپیری پێشتریشم هەر مردوون.. (( تەماشای تاوڵەکە ئەکا)) دەی هەر چۆنێکە، با یارییەکە تەواوکەین.. ئەوە چییە هههە ئەڵێی گزیت لێکردووم؟

بروسک: نا مامە چۆن دڵم دێ؟

زوبێر: بەلای منەوە گرنگ نییە کێ براوەیە، گرنگ تەواو کردنی یارییەکەیە.

بروسک: ئەها ڕوو لە دۆڕانی ئیتر شتێکیتر ئەڵێیت و وەکو ئەوسا دەمت گەرم نییە؟! هههە

(( سەرقاڵی یارییەکە ئەبن))

Cut

دیمەنی – ٦٥٣ – ڕ/ د – گوند:

(( دیدەوان لەگەڵ پیاوێکی کڵاش دروستکەردا ))

دیدەوان: وابێ ئەمساڵی بە تەواوەتیی پێ بەڕێکەم.

وەستا: هەر ئەمساڵ؟ کورە تۆ بڵێ پێنج ساڵیش، جووتێ کڵاشی وات بۆ دروست ئەکەم، نەک خۆت، لەپێی هیچ کەسێکیتریشا نەتبینیبێ.. تۆ کە تەواو بوو سەیریکەو هیچیتر.

دیدەوان: زۆر دەست و پل ڕەنگینی، لەو بڕوایەدام زۆر باش ئەبێ.

وەستا: پارەیەکی وات نەداومەتێ تایبەت نەبێ! ئەگەر بەدڵت نەبوو، هەموو پارەکەشت بۆ ئەگێڕمەوە. ئەها بەو خوا گەورەیە.

دیدەوان: نا نا وەستا گیان، زۆر دڵنیام تایبەت ئەبێ.

(( ١- ئەگەر وەستاکە باسی هەندێ تفاصیلی کەرەستەکانی بۆ بکا، کە هەمووی بە تایبەت بۆ ئەهێنێ، جوانترە

٢- دیدەوان خواحافیزیی و دەستخۆشیی و بە ناو دێکەدا دێتە خوارەوە، یان بەرەو لایەک ئەچێ))

Cut

دیمەنی – ٦٥٤ – ڕ/ د – دوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( شەماڵ و تایەر دێنە سەر دوکانی فیتەرەکە، کە هەر خۆیەتی))

تایەر: ئەوە پێموتی، من تا دوو سبەی مۆڵەتت ئەدەمێ.

فیتەر: ئەی ئەگەر نەهات برا من قوڕی کوێ بکەم بەسەرا.. یەکێکتان لێرە دانیشن بۆ ڕاست و درۆیی.

شەماڵ: ناڵێی ماتۆڕی تەواو نییە؟

فیتەر: بەڵێ وایوت.

شەماڵ:دەی کەواتە دێتەوەو تۆش هەواڵی ماڵی لێ بپرسەو بیدە بە ئێمە.

فیتەر: ئای خوای گەورە چۆن توش بووم.. جا گەر هەواڵی ماڵی بپرسم ئەو ئەمکوژێ و هەواڵیشی نەپرسم ئێوە.. کاکە بیللاهی وا نابێ من کابرایەکی کاسبم و پەیوەندیم چییە بە بەزمی ئێوەوە؟

تایەر: منیش نامەوێ دەستم بچێتە خوێنی تۆ، ئەزانم تاقەتی ئەو سەرێشەیەشت نییە.. بەڵام ئەگەر ئەوەم بۆ بکەی، پارەیەکی زۆر باشیشت ئەدەمێ و دڵنیاشت ئەکەم لە هیچ شوێنێکیش ناوت نابرێ.

فیتەر: ئەی ئەگەر گیرای؟ بۆ نموونە!

شەماڵ: ئەک دەمت شکێ باشە؟

تایەر: نا شەماڵ گیان، حەقی خۆیەتی، ئەی ڕەنگە بشگیرێم.. بابە من بەڵێنت ئەدەمێ ناوت نەبەم و بڵێم خۆم دوای کەوتووم.

فیتەر(( ڕامان و بیرکردنەوەیەک)): باشە کەوابێ شتێکت بۆ ئەکەم، ئەی لەسەر چەند ڕێککەوین، بە مەرجێ تا سەعاتێکیتر نیوەیم بدەیتێ.

شەماڵ: نیوەی چیت بدەینێ کابرا!!! ئەی ئەگەر هیچت بۆ نەکرا؟

فیتەر: بە قسەی ئەم کاکەیە بێ، توشی هیچ نابم و پارەیەکیشم دەست ئەکەوێ، لەبەرئەوە هەوڵ ئەدەم بەرێگەیەک ئەوە بکەم.. خۆ با بزانن ئەمتوانی بە پۆلیسیش بڵێم کە هەڕەشەم لێ ئەکەن.. بەڵام کە پارەی باش وەرگرم، ئەمەیان باشترە.. دەی بیڵێن.. چەندم ئەدەنێ؟

Cut

دیمەنی – ٦٥٥ – ڕ/ د – سەر عەرەبانەی خدر۳:

(( خدر۳ یەک دوو مشتەری بەڕێ ئەکاو ئەڕۆن.. شاموراد لێی نزیک ئەبێتەوە ))

شاموراد: گەورەم جەنابی پاشا ئەیەوێ قسەت لەگەڵ بکا!

خدر۳(( خۆ بەزلزانین )): جەنابی تەڕەماش؟ (( بەلاسا کردنەوەوە )) پاشا؟.. (( خدر۳ مۆبایل وەرئەگرێ )) ها کورە چیت ئەوێ؟ ئەوە چییە وەک جنۆکە خۆت شاردۆتەوە؟.......... چۆن؟ من کێم؟ ........ من سمکۆی نۆکاوفرۆشم، ئەوە تۆ عەیب ناکەی لە پشتی تەلەفونەوە خۆت شاردۆتەوە؟ وەرە بەردەمم و بزانم چیت ئەوێ؟.. پیاوی پیاوانە ڕووبەڕوو قسەئەکا............ نا نا من خۆم بە هیچ نازانم و تۆش هەر بە هیچ نازانم..... بەڵێ هێزم هەیەو هەموو خزمانی ئاواییم بانگ کردووەو لێرەن........... نەخێر من کەسی بێتاوانم بۆ ناکوژرێ، ئەوە ناکەم............. دەی گەر زۆر حەزت لە ئیشە، من ئەتوانم ڕێکبکەوم لەگەڵتا.. بەڵام پیاوانە وەرە بەرەو ڕووم........... نا نا کە تۆ هێزت هەبێ و منیش هەمبێ، ئەتوانین ئیشی گەورە بکەین و حسابیش بۆ کەس نەکەین، بەڵام پیاوکوشتن بێ ئەقڵیەکی گەورەیە........ نەوەڵا من تا ئێستا ئەم هێزەم بەس بۆ دوژمنایەتی بەکارهێناوە............. ئیشی چەور هەهە قەیچێکا کە ئیشی چەوریش هەبێ، با هەموو لایەک وەک یەکمان دەست بکەوێ ........... هەر کاتێ پێتخۆش بوو پێکەوە ئیش بکەین، ئەوا دەست لە نۆکاوەکەش هەڵئەگرم، بەڵام بۆ پیاو کوشتن نا، ئەگەر زۆر پێویست نەبێ.. باشە؟........ دەی چاوەڕوانی تەلەفونی تۆ ئەکەم، بەڵام جارێکیتر لێت خۆش نابم ئاوا بە سوکایەتییەوە بنێری بە شوێنما تێگەیشتی؟......... ئا دێیتە شوێنێک و منیش دێمە ئەوێ...... چەند کەس ئەهێنی لەگەڵ خۆتا بیهێنە، بە ڕاستی من حساب بۆ کەسەکانی تۆ هەر ناکەم، هەمووی وەک ئەم شامورادە خوێڕییەیە.......... ئای خۆ دیارە.......... ئەوا من لە ئێستەشەوە ناهێڵم بێنەوە بەم دوکانەیا، ئەیکەم بە جێی خۆم.......... دەی باشە. (( مۆبایل دائەخاتەوەو بۆ شاموراد )) ئەمە پاشا خوێڕییەکەت بوو، زمانی تەتەڵەی ئەکرد، نەیئەوێرا هیچ بڵێ.

شاموراد: ئاخر گەورەم منیش ئەو هەمووەم هەبێ، کەس ناوێرێ پێم بڵێ لەل.

خدر٣: دەی دوکانیشم بۆ چۆڵکەن و بڕۆن، ئەوە ڕزگاریشم کردن لە پاشاکەتان.. بەس ئەمە ژمارەی منە بیدەرێ. (( ژمارەی ئەداتێ))

Cut

دیمەنی – ٦٥٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( لەتیف لە بەردەمی ئاوا وەستاوە))

لەتیف: نەوەڵا کاک ئاوا تا ئێستا هیچمان تیا نەبینیوەتەوە، وا جارێ هەر خەریکیشن.

ئاوا(( زەنگی بۆ دێت)): کەوابێ با ئەویتریشی تەواو بێ (( مۆبایل هەڵئەگرێ)) بەڵێ پورە گێلاس خان. (( لەتیف سەلامێ ئەکاو ئەچێتە دەرەوە))

گێلاس(( دەنگ)): باشی ئاوا گیان؟

ئاوا: دەستت ماچ ئەکەم سوپاس باشم.

گێلاس: ئەمڕۆ تۆ دێیت، یان من بێم؟ خۆ ئامادەی؟

ئاوا: ئەی چۆن ئەی چۆن پورێ گین؟ ئیشی تۆم بیرناچێ.. بەڵام بەخوا بارێکی لێیە، ئەگەر بمبوری تۆ بێیت و ئەو ئەرکە بکێشی.

گێلاس: نا نا تکایە، ئاساییە، من دێم، گرنگ ئەوەیە ڕێی ئیشم نەگرتبی.

ئاوا بە هیچ شێوەیەک پورێ گیان.. لە خزمەتدام.

گێلاس: دەی زۆر باشە، کەواتە دێم و لەوێوە ئەچین بەدوای پارێزەرەکەیا.

ئاوا: هەر زۆر باشە.

گێلاس: دەی تا ئەتبینم.

ئاوا: خوات لەگەڵ.

Cut

دیمەنی – ٦٥٧ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس بە پێوەو نینا دانیشتووە.. جانتایەکی دبلۆماسی لەسەر مێزەکەیە، گێلاس دەستی ئەداتێ))

نینا: یاخوا ببێ بە خێرو بەرەکەت، زوو مایەی خۆی بگرێتەوە.

گێلاس: هانام بە دەمت نینا گیان.. ئەم پارەیە زۆر زۆرە، بەخوا نیوە زیاترم لەوەش دەرهێناوە کە بۆ تەلارەکەم دانابوو.

نینا: ئێستا بۆی ئەبەی؟

گێلاس: ئەچم بۆ لای کابرات و لەوێوە پارێزەرەکەش هەڵئەگرین و پێکەوە ئەچین.

نینا (( پێکەنین)): بەخوا جارێ کابرام نییە پورێ گیان، تەنها هاوڕێیەو هیچیتر.

گێلاس: نا نا عاقیبەتی بەخێرە.. تەنها هی خۆتە.

نینا(( بزە)): دەی باشە، با بەدڵی تۆ بێ.

گێلاس: ئاگات لە دیاریش بێ بەساقە.

نینا: ئێستا ڕۆڤانیش دێت و ئیتر پێکەوە ئەبن، خەمت نەبێ.. ئاگات لە خۆت و پارەکە بێ پورێ گیان.

گێلاس: بڕیت بەساقەوبم. جارێ خواحافیز.

نینا: خوات لەگەڵ.

(( گێلاس ئەچێتە دەرەوە))

——————— Cut ——————— تابع ———————

دیمەنی – ٦٥٨ – متبوع – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس بەرەو سەیارەکەی ئەچێت و ڕۆڤان نزیک ئەکەوێتەوە، ماتۆڕسوارێک دێتە سەر شۆستەکەو ڕۆڤان دیقەتی ئەدا، گێلاس بەرەو دەرگای سەیارەکەی ئەچێت و ماتۆڕسوارەکە جانتاکەی دەستی ئەفرێنێ.. گێلاس ئەقیژێنێ..

# (( ئەڵقەی سی و دوو))

ڕۆڤان ڕائەکاتە سەر پوری کە کەوتووەو نیناش بە ڕاکردن دێتە سەر پوری))

گێلاس: نینا پارەکانی برد نینا.. تەلەفون بۆ پۆلیس بکە.

نینا: هەر ئێستا پورێ گیان هەر ئێستا (( ڕائەکا بۆ ژوورەوە))

ڕۆڤان: پورێ چاک دیقەتیمدا، ئەتوانم ڕەسمی دروست بکەمەوەو بیدەین بە پۆلیس.

گێلاس (( هەستاوەتەوەو بەرەو ئۆفیس ئەچێ)): بە قوربانت بم خێرا ڕەسمی بکە تا بیرت نەچۆتەوە.

ڕۆڤان: بەسەرچاو پورێ گیان.

(( هەردووکیان بە خێرایی ئەچنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٥٩ – ڕ/ن - ئۆفیسی شۆڕش:

(( سەردار دێتە ژوورەوە.. شۆڕش شڵەژاوەو لەسەر ڕۆشتنە.. بەخێرهاتن))

سەردار: ئەوە بۆ وا شڵەژاوی شۆڕش؟ خۆ هیچ ڕووینەداوە؟

شۆڕش: سەردار گیان لێمانقەوماوە.. دز جانتایەکی پڕ پارەی لە دەستی گێلاسی خوشکم فڕاندووە. ئێستا کچەکەم تەلەفونی کرد.

سەردار: یەعنی ئەوەی بە تۆی ڕەوا نەبینی، دزی خوێڕی خواردی.

شۆڕش: وەختی ئەوە نییە، ئەمەوێ خێرا بیانگەمێ.. کوڕەکەم و کچەکەشم لەوێن.

سەردار: دانیشە شۆڕش، دانیشە.. خۆ تەقینەوە نییە بچی بە سۆراخیانەوە، دانیشە هەندێ قسەت بۆ بکەم.. تازە ئەوەی ڕوویداوە، ڕوویدا!

شۆڕش: ئاخر بزانم ئەدۆزرێتەوە؟ نادۆزرێتەوە؟

سەردار: دانیشە برا.. ئەوە ئیشی پۆلیسە ئیتر ئیشی کەس نییە، ئەوانیش (( بە خاویی)) خووووووائەزانێ.

شۆڕش (( دائەنیشێتەوە)): بەخوا زۆر دڵم لایانە.

سەردار: ئەگەر لێگەڕایە لەو پارەیەو تۆ بتخواردایە، بیری لە چێشتخانە نەئەکردەوەو ئەو هەموو پارەیەی بە گورگان خوارد نەئەچوو.. پارەی ئەو خوشکەت پارەی ئیفە، بۆیە وا بە تالانیی ئەبرێ.. پارەی چێشتخانەکە نییە وتت کڕیویەتی؟

شۆڕش: بەڵێ ئەو پارە زۆرەیە.

سەردار: برا وەرەو بەردەوامبە لەگەڵ منی، باوەڕت بێ ئەبی بە ملیۆنێر.. ئینجا ئەوەندە خۆشیشە هەست ئەکەی کەسێکت فریوداوەو پارەیەکی زۆرت دەستکەوتووە، هەر مەپرسە.

شۆڕش: نەبەخوا برا من بە عەمەلی ئەو ئیشە نایەم، جارێکم کرد هەر ڕیسواش بووم تیایا، بەڕاستیی من بەرگەی شەرمەزاریی وا گەورە ناگرم، جارێکیتر بێتەوە ڕێم، خۆم ئەکوژم.

سەردار: کەیفی خۆتە.. گەر ئەوە بکەی کە من ئەیکەم، هیچ پارەیەک و هیچ کەسێکت بە خەیاڵا نایەت خۆت نەبی.. بە قسەم بکەو خۆت لەم شپرزەییانەش بەدوور ئەگری.

شۆڕش: دێیت لەگەڵما بچین بۆ لایان؟

سەردار: ناوەڵا برا من تاقەتی پۆلیس و مەرکەزم نییە.. دوای ئەوە پارەش خوراو بڕایەوە، ئیتر بۆ خۆت عەزێت ئەدەی؟

شۆڕش: نا، ڕەنگە بدۆزرێتەوە.

سەردار: ئاخر چۆن ئەدۆزرێتەوە، خۆ کەس دوای دزەکە نەکەوتووە.

شۆڕش: نا نا کەس دوای نەکەوتووە.. بەس ڕۆڤانی کوڕم لەوێ بووە، باش دیقەتی کابرای داوەو ڕەسمی کێشاوەو داویانە بە پۆلیس.

سەردار (( کەمێک شڵەژان)): چۆن؟

شۆڕش: ئەوە پێت ناخۆش بوو سەردار؟

سەردار: کوڕە خەریکە شاگەشکە ئەبم بە توانای کوڕەکەت، سەیری ئەو ڕێککەوتە خۆشە چۆن گونجاوە؟.. بەڵکو پارەکە بگەڕێتەوەو بکەوێتەوە دەستی خۆمان.

شۆڕش: نەبەخوا ئیتر بە یەکجاریی من لەو باسە دەربێنە، دڵنیابە دووبارەی ناکەمەوە. . خۆ تۆش وتت دەستی لێ هەڵئەگرم.. دە هەستە با بڕۆین.

سەردار: نا من ئەگەڕێمەوە ئۆفیسی خۆم، دوایی پێم بڵێ چی کراوەو نەکراوە. ئیشەڵڵا ئەدۆزرێتەوە.. ئەک ئافەرین ڕۆڤان.

(( هەردووکیان ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٦٠ – ڕ/ د – دوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( فیتەر تەلەفون ئەکا ))

تایەر (( دەنگ )): جا بچوویتایە لەگەڵیا، باشترین فرسەت بوو!

فیتەر: حەیفت نەکرد کاک حەمە تایەر؟ هەر لەگەڵ وتی ماتۆڕەکەم لە ماڵەوەیەو پەکی کەوتووە، لە دڵەوە زۆرم پێخۆش بوو.. بەخوا تۆزێ خۆم لێ گران کردو ئەوسا چووم لەگەڵی.

تایەر: ئەک ئافەرین حەوتبرا.. دە ناونیشانەکەیم بدەرێ.

فیتەر: وەی بەسەر هەردوو چاوم.. تۆش باقی پارەکەم بۆ بێنە.

(( لە میوتیدا ناونیشانەکە ئەڵێ ))

Cut

دیمەنی – ٦٦١ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( ڕاهۆز بەپێوەو سەرکۆ دانیشتووە))

ڕاهۆز: گەورەم دۆسیەکەمان نارد بۆ بەڕێوەبەێتیی پۆلیس لەسەر فەرمانی داوەری لێکۆڵینەوە، دەسەڵاتی ئەوانەو زۆر بەپەلە ئەوانیش دۆسیەی تایبەتیان بۆ کردەوەو عەقید بەهێزیان کرد بە لێپرساوی دۆسیەکە.

سەرکۆ: مادام لەوێیەو دادوەر ئاگادارە خەمم نەما، پلانەکەشت پێوتن؟

ڕاهۆز: بە تەواوی وردەکارییەکانەوە گەورەم، ئەمڕۆ لە جێبەجێ کردنیدان.

سەرکۆ: ئەی هەواڵدەرەکەی خۆمان؟ خۆ هیچ ناکرێ بهێنرێتە دەرەوە، با بمێنێتەوە.

ڕاهۆز: گەورەم دڵی پلانەکەیە.. وامانکرد.

سەرکۆ: بەو هیوایەی سەلامەت بێ و هەڵە ڕوونەدا.

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٦٦٢ – ڕ/ د - شوێنێک:
(( میری گەورە بە جۆرێک دیارەو بە دەنگیش ناناسرێتەوە کە سەردارە، تێل ئەکا ))
میری گەورە: ١- لە سەرچاوەی خۆمەوە زانیومە، تۆ ئەوە بکەو تەواو . ..................... ٢- زۆرن؟........... ٣- هەموو ئەوەی لەسەری ئەیزانی دروستن؟ سەر بە هیچ شوێنێک نییە، زیانمان پێ بگەیەنێت؟ ............. ٤- زۆر باشە.. کەسێک ڕاسپێرە کە دزی لێ کرابێت و سمکۆ تۆمەتبار بکا کە، بە هۆی ئەوانەی چواردەوریییەوە دزیویەتی.. ئەگەر پۆلیس بەدەم سکاڵاکەوە هات و ئیشی ئسوڵییان لەگەڵ کرد، ئەوا لێی مەترسەو بیبینە، ئیتر ئەو کاتە خۆشم چاودێریی ئەکەم بزانم چی ڕوو ئەدا ........... ٥- کێشە نییە ئەگەر تەواو لێی دڵنیا بووینەوە، ئیشە گەورەکەی پێ ئەکەین...... ٦- دڵنیایی تۆ واتە ژیانت، سەرکێشیی کردن بە ژیانتەوە، بۆیە ئەبێ زۆر لێی دڵنیا بیت.. تۆ ئەوە بکە، ئەوە دوا تێستی سمکۆیە، هەرچەند ئێستا ئەیتوانی لە بری کەسوکار هانا بۆ پۆلیس ببات.. مادام ئەوەی نەکرد. کەمتر جێی مەترسییە.. کەمێ بێ ئەقڵ و خۆ بەشتزان دیارە، بۆ ئێمەش ئەو کەسانە ماددەی خام و هەویرن، چۆنمان بوێ ئەوەیان لێ دروست ئەکەین.. بە کەش و فشی ئێستای تێ مەکەوە............ ٧- دەی خێرا بچۆ ئەوەی پێموتی جێبەجێی بکە پاشا، هههههه یەکێ نەزانێ پاشای حەوت مەملەکەتی.
(( مۆبایل ئەخاتەوە ژێر تایەی سەیارە ))
———— Cut ————

دیمەنی – ٦٦٣ – ڕ/ ن – ژوورێک:
(( پاشا تێل ئەکا، بە جۆرێک نەناسرێتەوە ))
پاشا: ١- فەرمانتە میری گەورە زۆر ناخایەنێت.. ئەی چی لە سمکۆ بکەین؟ وەک پێمڕاگەیاندن خزم و کەسوکاری بۆ پاسەوانیی خۆی هێناوە .............. ٢- بەڵێ میری گەورەم زیاتر لە بیست کەس............ ٣- تا ئیستا ناتوانین بزانین ئەو خەڵکەی هاتوون خەڵکی کوێن، هەوڵێکماندا لە ماڵەکەی دراوسێی بپرسین، شەو بوو نەیانهێشت هیچ کەسێک لەو گەڕەکەش نزیک بکەوێتەوە، مەگەر بە ڕۆژ ئەوە بکەین...... ٤- سەرچاو میری گەورەم، وا ئەکەم، ئەو کەسە هەیە.. بە ڕۆژیش قسە لە ماڵە دراوسێکەی وەرئەگرم، بەڵام ئەم کابرایە، بۆ دزیی بەکارنایەت، حەزی لەوە نییە ئای.. شەریفە هەیە......... ٥- یەعنی ڕوخساریشی لا ئاشکرا بکەم گەورەم؟ ئاساییە؟............. ٦- باشە میری گەورە، فەرمانت جێبەجێ ئەکەم...... ٧- هههههە سەرچاو میری گەورەم.
(( بە پەلە ئەچێتە دەرەوە ))
———— Cut ————

دیمەنی – ٦٦٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئامۆ تێل ئەکا ))

ئامۆ: ئەوە بۆ دیار نیت کچێ؟ نەیکەی بەڕاست!

شەنیا(( دێتە ژوورەوەو هەر بە مۆبایلەکە)): بۆ دیار بم، بیری کەپڵە کۆنەکەت ئەکەی؟

ئامۆ: نا، بیری کەپڵە تازەکەم ئەکەم.

شەنیا (( مۆبایلەکەی هەڵئەگرێتەوەو خەندەیەک)): جا کێ ئەڵێ من بە تۆ ڕازیی ئەبم؟ هەر لە خۆتەوە بۆ ئەمکەی بە کەپڵی خۆت؟

ئامۆ: هەر لە خۆمەوە نییە، منیش بەشی ئەوە خوێنەواریی ڕەنگ و بۆم هەیە، شتەکان بە ڕوونیی بخوێنمەوە.

شەنیا: ئای کە نیتە؟! ئەی دوو سێ مانگە لە کوێ بووی؟

ئامۆ: لە سەفەر بووم، دوێنێ گەڕامەوە.

شەنیا: زەرەرت کرد.. منیش پێری زایەم کرد!

ئامۆ: چیت زایە کرد؟ کچێ!

شەنیا: دڵم زایە کرد، بۆ نابێ؟ تۆ نەهاتی بەلایاو کوڕێکیتر هات و بردی بۆ خۆی.

ئامۆ: قەینا هیچ نییە، کوڕەکە زوو بۆمان ئەهێنێتەوە، ئەوان فێرن ماوەیەک ئەبەن و دوایی پاساوێک ئەهێننەوەو ئەیگێڕنەوە، خۆ وەک من نین تەنها یەکجارو یەک کەس دڵیم باتێ.

شەنیا: بۆ لە تۆ وایە دڵدان ئەوەندە ئاسانە، هەرکەس هات و بیبا؟

ئامۆ: نا گوڵم دڵی تۆ ئەناسم، هەر بۆ یەک کەسە.

شەنیا ((بە خۆ نواندنەوە)): ئەی تەبعەن.

ئامۆ: دەی کەواتە منیش ئەیپارێزم ناهێڵم گەرد بگرێ.

شەنیا: جا کێ ئەڵێ ئەوەی دڵم داوەتێ تۆی؟ بۆ ئەوەندە لەخۆ ڕازیی و دڵنیای؟

ئامۆ (( هەڵئەسێ)): با لە ڕێگە قسەمان تەواو بکەین.. تەبعەن قۆڵیش ئەکەی بە قۆڵما؟

شەنیا: نا ئەوەیان نا ئامۆ.. پێکەوە ئەچین و پێکەوە دێینەوەو بەس.. بەڵام نەتوت بۆ کوێ؟

ئامۆ: ئەی ئەگەر وتم بۆ ناو ئاگر؟

شەنیا: هەهە حەز ئەکەی تۆ بڕۆ بەساقە، من لێرە چاوەڕێت ئەکەم.

ئامۆ: ئەها؟ خۆشەویستی ئەم سەردەمە ئاوایە!

شەنیا: ڕەنگە وابێ، بەڵام من بۆ ناو ئاگر نا.. بڵێ بەردەم تۆپی دەبابە، دێم پێکەوە لەبەردەمیا ئەوەستین.

ئامۆ: کچێ لێت تێکچووە، پێم نەوتووی ئەتبەم بۆ شەڕی داعش!

شەنیا (( لە کاتی قسەکانیا قۆڵی ئەگرێت بۆ دەرەوە)): یەڵڵا بۆ شەڕی داعش!

(( هەردووکیان ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٦٥ – ڕ/ د – لای موختارەکان:

(( ملازم ئاری موختارێکی بانگ کردووەو وێنەی بەدەست کێشراوی نەجاتی پێیە))

ئاری: ئەمە لە سنوری گەڕەکی ئێوەدا نییە؟

موختار: نەمبینیوە قوربان ببورە، نەوەڵا.

ئاری(( یەکێکیتریان ئەهێنێتە لاوە)): ئەمە لە سنوری گەڕەکی ئێوەدا نییە؟

موختار(( دیقەتی ئەدا)): نەوەڵا گەورەم نەمبینیوە.

ئاری(( یەکێکیتریان بانگ ئەکا)): ئەمە .........

موختار(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): قوربان ئەوە نەجاتە.. ئای چەند جوان دروستکراوە، خۆزگە خۆی کەمێک پیاو بووایە، قیروسیا لە ڕەسمەکەی.

ئاری: یەعنی لە گەڕەکی ئێوەدایە؟

موختار: بەڵێ بەڵێ قوربان گیان، لە ڕیزە خانووەکەی پشتەوەن.

ئاری: کەواتەماڵەکەشیان ئەزانی؟ زەحمەت نەبێ بەڵکو لەگەڵما بێی.

موختار (( بەدەم ڕێوە لەگەڵ ئاریدا)): بەڵێ، دیسان کەتنی ناوەتەوە؟

Cut

دیمەنی – ٦٦٦ – ڕ/ د - دوکانی حەمە تایەر:

(( حەمە تایەرو ئاکارو برزو و شەماڵ ))

تایەر: پەلە مەکەن ئێستا دێت.

شەماڵ: درەنگە درەنگ، کە بۆ نانی نیوەڕۆ چووەوە بۆ ماڵەوە، ئەگەینە سەری و سەری ئەخەینە قەبری باوکیەوە.

تایەر: دەی باوکیشم نانەکەی ئەخوات و نوێژەکەی ئەکات و دێتەوە (( سەیری سەعات ئەکا )) هەر دە دەقەیتر.

شەماڵ: ماڵەکەی دۆزرایەوە، ئیتر حەوت ڕووحی هەبێ دەرنابا.

تایەر: یەکەم فیشەک خۆم پێوەی ئەنێم.

برزو: نەوەڵا بۆ خۆمی جێهێڵە نەک خوانەخواست لە دەست بترازێ و بەری نەکەوێ، ئەوسا ئەویش بە ئاگا دێتەوەو تەقە ئەکا.. خۆی نابێ بە هێچ جۆرێک ئێمە بڕیاری ئەوە بدەین یەک کەس تەقە بکا، ئەبێ لەوکاتەدا دەستبەجێ چارەسەری بکەین.. ئەگەر چارەسەرەکەی بدەنە دەست من ئێوە بڵێن چی ئەکەم؟

شەماڵ (( هەردوو دەستی ئەگرێ بەسەری برزۆوە )): ئەرێ توخوا بەسە برزو ئەو هەموو قسەیە لە کوێوە ئەهێنی برا؟ کابرا برای کوژراوەو ئەیەوێ تۆڵە بکاتەوە، ئیتر چارەسەرو مارەسەری چی کاکە؟

برزو: ئاخر کاکە ئەبێ پێشوەخت ئێمە پلانێکی تۆکمە دابڕێژین و بۆ ئەوەی بتوانین هەر حاڵەتێکی نەخوازراو هاتە پێشەوە چارەسەر بکرێ، کاکە گیان.......

ئاکار (( قسەی پێ ئەبڕێ، بێ حەوسەڵە )): ئەرێ دە بەسە مردووت مرێ، بۆ ئەوەنە ئەڵێی؟ شەڵڵا زمانم بە بڕین چووایەو پێم نەوتیایە.. ئاححەح ماڵت قەت ئاوا نەبێ.

برزو: دەی وەڵڵا سا مادام واتان لێکرد، هەر نایەم، بەڵکو بە بێ ئەقڵی خۆتان تێ بکەون، خۆ مەجالی پیاوێکی ئاقڵ نادەن ڕێ و شوێنێکتان بۆ دانێ، دەبڕۆن بزانن چۆن

تێ ئەکەون! (( لە کاتی قسەکانیا هەموو سەریان داخستووەو پەستن)) دەبڕۆن چاوتان دەرئەهات (( ئەچێتە دەرەوە هەرچەند تایەر زۆر بانگی ئەکا))

تایەر(( تورە)): شەماڵ نەئەبووایە وا بکەی، بەڕاستی ناخۆشت کردووە، کاکە ئەوە پشت و کەسمە چۆن ئەبێ ئاوا دەریکەی؟

شەماڵ: یەعنی من پشت و کەست نیم تایەر؟

تایەر: کەیفی خۆتە چۆن تێ ئەگەی، سەد جارم پێوتووی ئەوەندە ئەو کوڕە مەشکێنە، دە جار زیاتر ئاگاداری کردوومەتەوە کە تۆ لەناو جەماعەتیشا ئەیشکێنی.. ئەرێ نەبڕایەوە؟

شەماڵ (( عاجز)): خەتای منە لەسەر تۆو ئیشی ئەمسالی وەک تۆ خۆم پیاوخراپ ئەکەم، سوپاس کاک حەمەتایەر، دەستخۆش (( ئەچێتە دەرەوە، ئاکار بانگی ئەکات و وەڵام ناداتەوە))

ئاکار: ئەوە چی بوو حەمەتایەر؟ سوکایەتیت زۆر پێکرد، ئەزانم ئێستا خوێنت گەرمەو زۆر بە پەلەی بۆ تۆڵە کردنەوە، بەڵام ناکرێ یەک یەکیش دەرمانکەی، ئێمە بۆ تۆ هاتووین.

تایەر: ئەگەر تۆش ئەترسی ئەتوانی بڕۆی، هەر خۆم هەموو شتێک ئەکەم.

ئاکار: من جێت ناهێڵم لە هیچ شوێنێکا حەمە تایەر ، من پشتتم.

تایەر: هەروەک ئەوجارەی بردمیان و خەریک بوو بمکوژن، لەگەڵمای تا پەتەکە.

ئاکار(( توورە)): ئەرێ ئەوە تۆ بۆ هیچت لە چاوا نییە؟ خەو و خۆراکمان لەم ماوەیەدا هەر تۆو هەوڵی تۆڵە کردنەوەیە.. ئیتر بوو بە چی یەکجار نەمتووانیوە شتێ بکەم هەزارجارت دایەوە بە ڕووما؟

تایەر: بڕۆ دەرەوە تۆشم ناوێ، شتێ بە منەت بێ لە پێی ئەکەم، ئەرەوەڵا ئەوەندە ترسنۆکی تا خوا ئەڵێ بەس.

ئاكار: ئەوە منیش ئەڕۆم، بەڵام خوا وەكیل بە بەرچاومەوە بتكوژن دەستی كەسێک ناگرم با بزانی، ئیشەڵڵا ئێوارەش مەیتەكەت دێتەوەو ئێمەش هەر ناشتنەكەتمان لەسەرە.

تایەر: بەقوربانم بی ئیشەڵڵا.. تۆش بڕۆ ملت بشكێنە.

(( ئاكار بە تووڕەیی ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٦٦٧ – ڕ/ د – ناو بازاڕ:

Mute

(( زوبێر هەردوو دەستی خستۆتە پشتی و بە بازاڕا ورد ورد ئەڕواو نزیکی دوکانی مۆبایل فرۆشەکان کەوتۆتەوەو چاو ئەگێڕێ ))

Cut

دیمەنی – ٦٦٨ – ڕ/ن – ژووری عەقید بەهێز:

(( عقید بە هێز دانیشتووە.. قطعەیەک لەسەر مێزەکەی نوسراوە (( عەقید بەهێز رمضان تۆفیق)) مولازم ئاری دێتە ژوورەوە تەحیە ئەکا))

بەهێز: دۆزرایەوە؟

ئاری: بەڵێ گەورەم موختاری گەڕەکماڵەکەی نیشاندااین و فەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوەشمان بە چوونە ناو ماڵ و دەستگیر کردنی پێیە.

بەهێز: زۆر باشە دەستخۆش.. با هێزەکە ئامادە بکرێ و چاوەڕوان بن خۆشم ئێستا دێم.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.. هەر ئێستا.

(( ئاری تحیە ئەکات و ئەچێتە دەرەوە.. بەهێز چەند ئەوراقێک هەڵئەداتەوەو یەکێکیان ئیمزا ئەکات و بەوجۆرە.. پاش ماوەیەک هەڵئەسێت))

Cut

دیمەنی – ٦٦٩ – ڕ/ د – بەردەمی بنكەی پۆلیس:

(( گێلاس و نارەوەن و ئاكۆو شۆڕش پێكەوە وەستاون، شەنیاو ئامۆ كەمێک دوورتر پێكەوە، نیناو ڕۆڤان ئاوا كەمێک ئەولاتر))

(( لای ئامۆو شەنیا ))

ئامۆ: قەت ئەوە دایكم نەبووە، نەزانێ كێیە ئەوەی لەگەڵمایە؟! چۆن خۆی بۆ گیراوە نازانم؟ ڕەنگە بێتاقەت بێ!

شەنیا(( سوعبەت )): نا.. ئەوە ئەزانێ من ناشرینم، دیارە كەیفی پێم نایەو نایەوێ بمناسێ.

ئامۆ: نا نا دایكم وانییە، هەموو كەسێكی پێ جوانە زۆر سەیرە، بەس حەز ئەكا هەموو شتێ بزانێ.. ڕەنگە بشزانێ من تاقەتی سەروسەكوتی كچانم نییە، ئیتر ئاسایی وەریگرێ.

شەنیا: ئاوا !!!!! یەعنی ئەو ڕوخسارە جوانەمت كرد بە سەروسەكوت؟

ئامۆ: هەهە ئەی چییە بەقوربان؟ بۆ ناڵێی سەروسەكوتم نییە هەهە

شەنیا(( سەیری ئاوا ئەكا )): ئەی ئەو كچە جوانەو ئەو كوڕە جوانەو ئەو گەنجە كێیە لەگەڵیانە؟

ئامۆ: كوڕەكە ناوی ئاوایەو شوبرای داهاتووی تۆیە.. كچەكەش لە داهاتوودا ئەبێتە خێزانی، یەعنی هێوەر ژنی داهاتووی خۆتە.. ئەو كوڕە گەنجەش ژنبرای داهاتووی شوبراكەتە.

شەنیا: هەر لە خۆتەوە فاڵ بۆ داهاتوو ئەگریتەوە.. ئەوە چییە كێ ئەڵێ وا ئەبێ؟

(( لای ئاواو نینا ))

نینا: ئامۆی برات ژنی هەیە؟

ئاوا: نا لەوەئەچێ ئەویش بەنیاز بێ.

ڕۆڤان: بۆ کێیتر بە نیازە؟

نینا(( ئاماژەی ئاوا ئەکا)): ئای، کاکیشم بە نیازە ژن بێنێ، بەس جارێ نازانێ کێیە! هههه

ڕۆڤان: هەرچەند سەیر ئەکەم ئەو ژنەی لە تۆ ئەچێ.

نینا (( پیا ئەکێشێ و ڕۆڤان بە پشتاو بە پەلە ئەچێتە دواوە)): ئەوە چییە نازانی قسە بکەی؟

ئاوا (( ڕۆڤان ئەچێتە لایەکەوەو مۆبایل دەرئەهێنێ)): وابزانم هەموو کەسێک ئەزانێ خۆم و خۆت نەبین.

نینا: هەی حەددت نەبێ، منالەو هەر لە خۆیەوە قسە ئەکا.

ئاوا: ئەی ئەوانیتر بۆ لێگەڕاون پێکەوە بین؟ باوکت و دایکم و پورێ و .....

نینا(( لاسارانە)): ئینجا چییە؟ هاوڕێین و پێکەوە وەستاوین.

ئاوا (( کەمێک بە بەرزی)): دایکە، دایکە!

نینا: ئەوە چی ئەکەی؟

ئاوا: یەک یەک بانگیان ئەکەم، بزانم من و تۆ بە چی ئەزانن (( نارەوەن دێتە لایان)) دایکە جوانە!

نارەوەن (( ئیحراج)): توخوا ئێستا وەختی ئەوەیە؟ (( نینا ئیحراج))

ئاوا: نەخێر هەر ئەبێ پێم بڵێی جوانە یان نا؟

نارەوەن: ماشەڵڵای لێ بێ، هەر ئەڵێی گوڵە.. یاخوا پیرۆز بە یەک بن.

ئاوا: دەبڕۆ خوات لەگەڵ.

نارەوەن(( بەدەم ڕۆشتنەوە)): باشە بەساقەوبم ئەچمەوە لای گێلاس.

نینا: هەتیو تۆ شێتیی!!!!! ئەوە چیت کرد زۆر ئیحراج بووم، هەر هیچم پێ نەوترا!

ئاوا: پێمنەوتی هەر خۆم و خۆت نایزانین.. کێیتر بانگکەم؟ تۆ ناوی بێنەو با بانگیکەم.

نینا(( بە پێکەنینەوە)): باوکم. هههە.

ئاوا: کاک شۆڕش زەحمەت نەبێ.

نینا (( سەردائەخاو بە سووکیی)): هەتیو نەکەی ئەتکوژێ؟!

ـــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٦٧٠ – ڕ/ د – دوکانی فیتەری ماتۆڕ:

(( تایەر لە دوکانی فیتەری ماتۆڕەو فیتەرەکە لە میوتیدا ناونیشانی بۆ هەڵئەداو تایەر سەرئەلەقێنێ))

تایەر: هەر لە فەرعەکە بچمە ژوورەوەو لەوسەرەوە یەکەم دەرگا؟

فیتەر: بەڵێ بەلی، گەڕەکەکانی پشتەوە لێت تێک نەچێ.

تایەر: نا نا لێم تێک ناچێ حاڵیی بووم.. (( دەست ئەکا بەگیرفانیاو برە پارەیەکی ئەداتێ))

فیتەر: بەڵام ئامان کاک حەمەتایەر لەسەر بەڵێنەکەی خۆت بی، لای کەس ناوم نەبەی.

تایەر: دڵنیابە لەسەریشم بەن ناوت نابەم، من زۆر ممنونی تۆم.. دەی خواحافیز، درەنگە بەڵکو لەم کاتەیا لە ماڵەوە بیگرم.

فیتەر: لە ئامانەتی خوادا بی.

Cut

دیمەنی – ٦٧١ – ڕ/ن – ماڵی نەجات:

(( نەجات تێل ئەکا ))

نەجات: بەڵێ گەورەم لەماڵەوەم، پارەکەشم بۆ داناوی.

میر(( دەنگ)): باشە کاکەی من دەستت خۆش بێ.. وا حەسەن ئەگاتە لات پارەکە بدە بەو.. پێموتووە بەشەکەی خۆشت بداتێ.

نەجات: دەستت ماچ ئەکەم گەورەم زۆر سوپاس.

میر: دەی ئاگات لە خۆت بێ باوکەکەم.

نەجات: خوات لەگەڵ گەورەم، زۆر سوپاس.

Cut

دیمەنی – ٦٧٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٦٩ – بەر بنکەی پۆلیس:

شۆڕش (( دێتە بەردەمیان)): ئیشەڵڵا ئەدۆزرێتەوە، وا کەمێکیتر دەرئەچن بیگرن.. فەرموو ئاوا گیان!

ئاوا: ئەڵێم ئاساییە من و نینا بە جیا وەستاوین؟

شۆڕش(( ئاماژە ئەکا وەک بڵێ چی بکەم و خەندە)): کەیفی خۆتانە هیچ پەیوەندیی بە منەوە نییە، خۆتان گەورەو ئاقڵن. (( ئەڕوا))

ئاوا: چیم پێوتی؟ بەس من و تۆ نایزانین!

نینا: دەی ئەرز با لە ئاسمان من شوو بە شێت ناکەم.. هەتیو هەر زۆر شێتی من نەمزانیبوو ئاوای.

نینا: با باش ئەتزانی ئاوام، ئەی چۆن؟ من ئاوام.

(( پێکەنین))

(( لای گێلاسەوە))

گێلاس: مەولویەکی گەورەم بڕیارداوە بدۆزرێتەوە.

ئاکۆ: وەڵا باوکم هەمووی ئازایەتیی ڕۆڤان بوو، وا جوانی کێشابوو، زۆر بە زوویی ماڵەکەیان دۆزییەوە.

شۆڕش: دیارە بە هۆی موختارەکان و ئەنجومەن و شتەوە ناسراوەتەوە.

نارەوەن: ئیتر پۆلیسەو ڕێگەی خۆیان هەیە، بەخوا کەس لە دەستی قوتاری نابێ.

گێلاس: ئەرێ نارەوەن خان ئەو کچە جوانە کێیە لەگەڵ ئامۆدا؟

نارەوەن: وەڵا نازانم، جارێکیتر بینیم هات بۆ داوای یارمەتی بۆ ماڵە هەژاران، ڕەنگە پارێزەر بێ بۆی هێنابین، ئەگینا ئامۆ تاقەتی دەورو خولی کچانی نییە.. دڵی شکاوە، نایەوێ قەت باسی ژنهێنانی لا بکەمەوە، زۆر تووڕە ئەبێ.

گێلاس: بەخوا نارەوەن بڵێم چی؟ تۆ ڕاست ئەکەی، بەس ڕەنگە ئەوە جیاواز بێ.

نارەوەن: هەهەهەهەهە جیاواز؟! حەز ئەکەی بانگیان ئەکەم بۆ ئێرەو خۆتان بزانن چییە؟

ئادەی ئامۆ، تۆو ئەو کچە جوانە تا ئێرە وەرن باوکەکەم. (( شەنیاو ئامۆ دێن و تعارف، دواتر)) ئەم کچە جوانە کێیە ئامۆ گیان؟

ئامۆ: شەنیایە.

نارەوەن: ئەزانم ناوەکەیت وت، ئەی چی ئەکا لێرە؟

ئامۆ: دایکە گیان ئەگەر بفەرمووی یەک مانگیتر ئەبێ بە بووکت.

نارەوەن(( سوعبەت و ئیحراج)): هەی ڕووت ڕەش نەبێ، تۆ بڕیارت چی بوو؟

ئامۆ: جا دایە ئەم بەڵایە ئەهێڵێ بڕیار ببەیتە سەر؟ (( پێکەنینی گشتیی)) ئەها چەند جوانە؟ ئیتر بڕیار چۆن بڕ ئەکا؟

گێلاس: نەوەڵا باوکم بڕ ناکا هەهەهە

(( پێکەنینی هەمووان و پیرۆزبایی و ئیحراجیی زۆری شەنیاو سوپاس کردنیان))

________ گەڕانەوەی هەیە ________________ Cut ________

دیمەنی – ٦٧٣ – ڕ/ د – عەرەبانەکەی خدر٣:

(( سەیارەیەکی پۆلیس دێت و بۆ خدر٣ دائەبەزن، خدر٣ پێی سەیر ئەبێ))

خدر٣: ئەوە چییە کاکە؟

پۆلیس: تۆ سمکۆ باوەفاخر عەزیزیت؟

خدر٣: بەڵێ.

پۆلیس: فەرمانی دادوەرمان پێیە بە گرتنت.

خدر٣: لەسەر چی کاکی پۆلیس؟

پۆلیس: بە تۆمەتی دزیی کردن لەماڵی ئەو پیاوە.

خدر٣: من نە ئەو پیاوەم دیوەو نە ئەیناسم و نە بە ژیانیشم دزیەکم کردووە.

پۆلیس: کێ لە خزم و کەس و کارت لەم دەوروبەرەیە، ئەوانیش تۆمەتبارن.

خدر٣(( تەماشای جادە ئەکا کەسی لێ نییە، تێ ئەگا شتێک هەیە)): جادە کەسی تیایە؟ تا لەگەڵ من یان دوژمنم بن؟.. ئینجا بزانن هەمووی هەڵبەستراوە.

پۆلیس: تا ئەگەینە بنکە، بێدەنگیی بپارێزەو لەوێ بەرگریی لە خۆت بکە.

خدر٣: بەڵێ باشە بەسەرچاو، بەڵام با عەرەبانەکە بە کەسێک بسپێرم.

(( لە دوکانێکا یەکێک بانگ ئەکاو لەگەڵیا عەرەبانەکە ئەبەنە بەر دوکانەکەی))

Cut

دیمەنی – ٦٧٤ – ڕ/ د – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٧٢ – بەردەم بنکەی پۆلیس:

(( پۆلیس سواری سەیارەیەکەی پۆلیس ئەبن، یان لە دەرگای بنکەکەوە سەیارەیەکی پڕ پۆلیس بە هۆڕنی تایبەت بە پۆلیسەوە بە خێرایی دەرئەچن))

شۆڕش: ئەی قوربانتان.. ئەوا دەرچوون.. نیو سەعاتیتر پارەکە دێتەوە بەردەستت.

نارەوەن: خوایە تۆ کردبێتت.

ئاوا (( لەولاترەوە)): ڕۆشتن!!

گێلاس: دەی خوای گەورە دڵمان خۆشکەی.

نارەوەن: ئیشەڵڵا دڵی تۆو ئێمەش خۆش ئەکا، خوا بەڕەحمە گێلاس گیان.

(( ئەوان وەستاون و ئامۆو شەنیاش جیا بوونەتەوەو لە لایەکیترەوە وەستاون))

______ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut ___________

دیمەنی – ٦٧٥ – ڕ/ د – بەر ماڵی نەجات، لە گەڕەکی شەعبیدا:

(( ماوەیەک حەمە تایەر چاودێریی ئەکات و دواتر مناڵێک پەیا ئەبێ.. تایەر ئەچێتە بەردەمی))

تایەر: بچکۆل ئەوە ماڵی کاک نەجاتە؟

مناڵ: ئەوەی ماتۆڕەکەی پێیە؟

تایەر: ئا ئا.

مناڵ: بەڵێ.

تایەر: باشە بەساقەوبم گوڵەکەم.

(( تایەر ئەکشێتەوەو چاودێریی ئەکا تا کەس دیار نەمێنێ))

Cut

دیمەنی – ٦٧٦ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٧٤ – بەر بنکەی پۆلیس:

(( سەیارەکەی پۆلیس کە خدر٣ی تیایە، بە خیرایی ئەگەڕێتەوە بۆ بنکەی پۆلیس.. خدر٣ ئەوان ئەبینێت و دڵی ئەترسێ، نارەوەن و ئامۆو ئاواش هەڵشۆ ئەبینن و بەرەو بنکەکە ئەچێ.. پێیان سەیر ئەبێ، پۆلیسەکان خدر٣و هەڵشۆ ئەبەنە ژوورەوە))

نارەوەن(( بۆ گێلاس و ئەوان)): بە یارمەتیتان، تا ژوورەوە ئەچم.

ئاکۆ: پێویستیت بە ئێمە نییە؟

نارەوەن: نا کاک ئاکۆ گیان، هیچ نییە هەر یەک دەقە.

ئاوا(( بە دەنگی بەرز)): دایکە!!

نارەوەن: هیچ نییە کاکە ئێستا دێمەوە.

(( ئەوانیتر لە دەرەوە ئەوەستن))

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٦٧٧ – ڕ/ن – ناو بنکەی پۆلیس:

(( خدر٣ و هەڵشۆ، لەبەردەم ژووری عەقید بەهێز وەستاون.. پۆلیسێک دێت))

پۆلیس: جەنابی بەڕێوەبەر وتی با چاوەڕوانی عەقید بەهێز بکەن.

نارەوەن(( ئەگاتە ئەوێ و توڕە)): ئەوە چییە هەڵشۆ بۆ گیراوی؟

هەڵشۆ: نەگیراوم نارەوەن خان.. گومان ئەکرێ ئەم کابرایە دزییەکەی لێکردبم.

خدر٣(( تەواو دەنگ ئەگۆڕێ و زمان گرتن)): ئەەەەەک بە درۆ ببببببتەقی هەی بوخ خ خ ختانچی.. ئاخر من هە هە هە هەر ناشزانم مممممماڵت لە کوێیە.

نارەوەن: کێ پێی وتی ئەمە؟

هەڵشۆ: خەڵک وتیان و شایەتیشیاندا لای ئەفسەرەکەو لای داوەریش.

خدر٣(( بۆ نارەوەن)): بببببەخوا دایکەکەم دددددددرۆ ئەکا، من بە ژژژژژیانم دزیم نەکردووەو لەم شششارەشدا غەریبم، خەڵکی ئەووووو گوندانەی سسسسسسەر سنورم.

نارەوەن: هەڵشۆ ئەگەر گومانەکەت تەواو نییەو شایاتەکەشت ساختەیە، توشی سجن و شتی مەکە گوناحە، داماو دیارە.

هەڵشۆ: با لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن، دەرئەکەوێ.

خدر٣(( بەوجۆرەی پێشوو زمانی ئەیگرێ)): ئەی ئێوە چیتان ئەکرد لێرە دادە گیان؟

نارەوەن: دراوسێییەکمان دزیی لێکراوە، بەڵام بۆ پرسیت؟

خدر٣: وەڵا هەروا، وتم بەڵکو ببی بە بەختەبارانێ بۆ من و (( نارەوەن هەڵوێستە ئەکاو بە وردیی تەماشای ئەکا.. دەست ئەگرێ بە دەمیەوە سوکە خەندەیەک)) وەک فریشتە بێی بە هانامەوەو ڕزگارم بکەی لەم بوختانچییە.

نارەوەن: تۆ ناوت چییە؟

خدر٣: سمکۆی خزمەکارت.

نارەوەن: هەڵشۆ من خەڵک بە چاو و برۆیا باش ئەناسمەوەو ئەگەر دزو درۆزن بێ یەکسەر پێوەی دیارە..

هەڵشۆ: جا بەڕای تۆ ئەم نییە دزییەکەی لێکردبم؟

نارەوەن: کەیفی خۆتانە، با لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن.. بەڵام دڵنیام ئەم نییە، ئەوە ڕای من.

هەڵشۆ: دەی با بزانین چۆن ئەبێ.

(( نارەوەن ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٦٧٨ – ڕ/ د – بەرماڵی نەجات:

Mute

(( حەمەتایەر چاو ئەگێڕێت و بە ماتەمات نزیکی ماڵی نەجات ئەبێتەوە.. ئەیەوێ سەرکەوێتە سەر دیوارەکە ناتوانێ، دەست لە دەرگاوە ئەدات، بەدەستیەوە ئەکرێتەوە.. دەمانچەکەی ئەگرێ بە دەستەوەو ئەچێتە ژوورەوە ))

Cut

دیمەنی – ٦٧٩ – ڕ/ د – دوکانی مۆبایلی ڕێژوان:

(( زوبێر لە بەردەمی دوکانەکەو ڕێژوان و سەلواش لە نزیکی وەستاون))

زوبێر: زۆر گەورەو باشە.. خێرباتەوە.. وا بزانم بۆ ئێوە پڕ بە پێستیەتی!

ڕێژوان: داهاتێکی باشی هەیە باوکە، بۆ من و سەلوا هیچ عەیبی نییە.

سەلوا: ڕۆژەکە هەموو لێرەین و ئێوارانیش من ئەچمەوە شتێ ئامادە ئەکەم تا ئەگەڕێتەوە.

زوبێر: ئافەرین، لەشتان ساغ بێ.

ڕێژوان: باوکە تۆش بۆ نایەی وەکالەتێکی گەورە بکەیتەوەو یەکێکمانی بخەیتە سەر.

زوبێر(( پێکەنین)): خراپ نالێ مێردە قۆزەکەت، ئەیەوێ بیکا بە دوو.. وریا بە کچێ ژنیش نەکا بە دوو ها.. هههە.

سەلوا: نا نا مامە گیان خەمی ئەوەیانم نییە، باش ئەیناسم.. باوەڕ ناکەم قەت بیری لێ بکاتەوە.

ڕێژوان: نەوەڵا بیر لەوە ناکەمەوە، بۆ دوکانیش وەک هاوکاریی سەرەتایی پێموتی، وتم دانیشتن بۆ تۆ لێرە ڕەنگە خۆش نەبێ با هاوکاریت بکەم.

زوبێر: خەمی منت نەبێ ڕۆڵە، هەر بەیانی و دوو بەیانی شتێک ڕێک ئەخەم.. دەی ئێوە خەریکی ئیشی خۆتان بن باوکە.. من ئەڕۆم.

(( خواحافیزیی و بەڕێکردن))

Cut

دیمەنی – ٦٨٠ – ڕ/ د –ماڵی نەجات، خانووی شەرقیی/ حەوشەو ژوورێک:

(( تایەر بە وریایی بەدوای نەجاتدا ئەگەڕێ.. لە ژوورەکە نزیک ئەبێتەوە، قاچێک ئەبینێت درێژ کراوەو دەمانچە ڕائەکێشێت

# (( ئەڵقەی سی و سێ))

بە پەلە خۆی هەڵئەداتە ناو دەرگای ژوورەکە..

ئەبینێ نەجات فیشەکێک بە سەریەوە یان دڵیەوە هەیەو تاس ئەیباتەوە.. دەنگی سەیارەی پۆلیس دێت))

تایەر: ئای خوایە ئەوە چییە؟ خۆ کوژراوە.. حەتمەن ئاکارو شەماڵ و ئەوان پێش من گەیشتوونەتە سەری، ئەوە خۆ پۆلیسیش گەیشت، ڕەنگە ئێستا وابزانن من کوشتوومە.. ئای خوایە، خۆ خەریکە هەر لە هیچ توش بم.

(( دەنگی سەیارەی پۆلیس زۆر نزیک ئەبێتەوە.. بەرەو دەرگای حەوشە ئەگەڕێتەوەو دەمانچەکەی هەر بە دەستەوەیە.. ئەچێتە دەرەوە))

تابع ــــــــــــــــ Cut ــــــــــــــــ

دیمەنی – ٦٨١ – متبوع – بەردەرگای ماڵ نەجات:

(( پۆلیس چواردەوری تایەر ئەگرن کە دێتە دەرەوەو و تێی ئەخوڕن کە دەمانچەکەی دانێ و دەستی بەرز بکاتەوەو لە دەمانچەکە دووركەوێتەوە، سەرەتا واق وڕماوەو نازانێ چی ئەگوزەرێ، ئاگای لە دەمانچەکەی نییەو دووبارە کە پێی ئەڵێنەوە، دەمانچەکەی دائەنێت و دەست ئەخاتە پشت سەری و دوور ئەکەوێتەوە ))

تایەر: من نەمکوشت، کە گەیشتمە سەری کوژرابوو.

بەهێز: جارێ بچۆ دواوە (( پۆلیس دەمانچەکە هەڵئەگرنەوە بە ڕێگەی خۆیان و یەک دووانێکیان ئەچنە ژوورەوەو بە خێرایی دێنەوە دەرەوە ))

پۆلیس: گەورەم کوژراوە.

بەهێز: خێرا کەللەپچەیکەن.

تایەر: بەخوا من نەمکوشتووە، کە هاتم کوژرابوو.. (( پۆلیس کەللەپچەی ئەکەن)) قوربان من نەمکوشتووە.

بەهێز: بێدەنگ بە.. (( بۆ پۆلیس)) سەریخەن.. کارڕایی تەرمەکە بکەن و بیبەن بۆ پزیشکی دادوەریی و باش ماڵەکەش بگەڕێن، هەر پارەو شتێکی گرنگتان دۆزییەوە بیهێننەوە.

مولازم ئاری: فەرمانتە گەورەم. (( بەهێز سواری سەیارەیەکی پۆلیس ئەبێت کە تایەری تیایەو ئەڕۆن.. سەیارەکەیتر لەگەڵ ملازم ئاریدا جێ ئەمێنن و هەندێکیان ئەچنە ژوورەوە )).

Cut

دیمەنی – ٦٨٢ – ڕ/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ بە تەنها لە ماڵەوەیە، بیرئەکاتەوە))

<u>تیرۆژ: مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

ئاخر نابێ وا بێ، خۆ قسە نەکەم، ئەوانیش بە تەپڵەک و مێزم ئەزانن.. ئەی وایە منیش هیچ دەنگم لێ نایەت، وەڵا تەپڵەک و مێزەکە باشترن، باش نییە جاروبار یەکێ ئەیانسڕێتەوەو باجی ئاڵتونیش جومعان جێی یەک پەنجە تۆزیان پێوە ناهێڵێ؟ ئەی لەم چواردیوارەیا چی بکەم بە تەنیا؟ ئای ئای، خۆ هەر کەسێکیان ناڵێ بەشەرێک هەیە لە ماڵەکەمانا؟! تۆ بڵێی حسابی کەناریی و خورماخۆرەم بۆ نەکەن؟ وەڵا ئەگەر ئەو حسابەشیان بۆ بکردمایە نێرەیەکیان ئەخستە قەفەسەکەمەوە، بۆئەوەی بێچوویان بۆ هەڵێنن.. نا، هەر وەک دیوارەکە سەیرم ئەکەن و هیچیتر.. باش نارەوەن خان! باش!.. ئا ئا بۆم نییە حەز لە خدرە حەماڵەکەشیان بکەم؟!!! ئا ئا ئا وەی لەو ڕەحم و خۆشەویستییەیان، باشە لە خدر زیاتر چ پیاوێکم بینیوە؟ ئەوە تایەرە خوێڕیش وازی لێهێنام! ناتوانم یەک هاوڕێی زانکۆش ببینم، ماڵەوەو ماڵەوە.. دەی کەوای لێهات، خۆم ئەزانم چیتان پێ ئەکەم.. ئێوە سوپرایزی تیرۆژتان نەبینیوە، ناهەقتان نییە.

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>.

——————— Cut ———————

دیمەنی – ٦٨٣ – ڕ/ د - بەردەرگای پۆلیس:

(( هەموو وەستاون، ڕۆڤان نەبێ.. شەنیاو ئامۆ نزیک ئەکەونەوە ))

ئامۆ: ئەگەر پێویستیتان بە ئێمە نییە، ئەگەڕێینەوە بۆ ئۆفیس.

گێلاس: یاخوا ماڵتان ئاوا بێ، بەخوا پێویستی بەو عەزێتەش نەئەکرد، زۆر دەمێکە وەستاون ماندوو بوون.. نەوەڵا کاکە ئامۆ گیان، ئیسراحەتی خۆتان وەرگرن.

(( وەڵامی ئامۆو شەنیاو خواحافیزییان، لە هەموو ))

گێلاس: ئەی توخوا نارەوەن خان تۆش بڕۆ چاوەکەم زۆر ماندوویت، کچەکەش هەر خۆیەتی.

نارەوەن: ئەوە بەڕاستتە گێلاس خان گیان، چۆن شتی وا ئەکەم؟ تا لێرە بیت، پێم لەگەڵ پێتایە.. باسی شتی وا هەر نەکەی.

گێلاس: خوا لە خوشکایەتیت کەم نەکا.. (( بۆ نینا )) ئەی نینا ڕۆڤان چی لێهات؟

نینا (( کەمێک لەولاترەوە )): نازانم پورێ گیان، هەر لەمناوە بوو، ڕەنگە تاقەتی چووبێ، ڕۆشتبێتەوە.

گێلاس: دە تۆش بڕۆوە بۆ ئۆفیس کچم، دیار تەنیایە.

ئاوا: دەی منیش ئەڕۆم پورە گێلاس گیان، لەسەر ڕێگەشمەوە ئەیگەیەنم.. پێویستیتان بە هەر شتێ بوو، تێلم بۆ بکەن.

گێلاس: باشە کاکە ئاوا گیان لەشت ساغ بێ کوڕم، زۆر سوپاس.

(( خواحافیزیی هەمووان.. گێلاس و نارەوەن و شۆڕش و ئاکۆ ئەمێننەوە ))

Cut

دیمەنی -٦٨٤- ڕ/د - چایخانەکە:

(( هاوڕێ لەفەی بۆ خەڵک داناوەو چا تێ ئەکا.. پاش کەمێک زوبێر لە پشتەوە دێت و هاوڕێ ئاگای لە خۆی نییەو نازانێ کە زوبێرە سڵاوی لێ ئەکا))

هاوڕێ: دانیشە بەسەرچاو ئێستا دێمە خزمەتت، لە پێشتەوە هەیە.

زوبێر: تۆ وەرە باوکە، من هیچم ناوێ، پرسیارێکم هەیە.

هاوڕێ: دەی فەرموو ئەمر کە(( سەری بۆ هەڵئەبڕێ)) ئۆووو مامۆستا زوبێر گیان توخوا عەفومکە بەخوا نەمزانی جەنابتی.. دەتوخوا دانیشە چایەکی جوانت بۆ تێکەم.. توخوا برسیت نییە؟

زوبێر: نا هاوڕێ گیان، هەر ویستم بپرسم، ئۆفیسی ئامۆ بۆ داخراوە، سوپاست ئەکەم باوکەکەم.

هاوڕێ: بەخوا وا بزانم لەگەڵ کچەکەی هاوڕێی ئەوانیش چوون بۆ بنکەی پۆلیس.....

زوبێر(( قسەی پێ ئەبڕێ)): بۆ؟ خێر؟ بۆ بنکەی پۆلیس؟

هاوڕێ: وا بزانم دراوسێیەکیان دزییەکی گەورەی لێکراوە، ئیتر لە خۆیەتی یان باوک و برای؟ ئەوە باش نازانم.

زوبێر: ئەها، یەعنی خۆیان سەلامەتن؟

هاوڕێ: بەڵێ شوکر بۆ خوا خۆیان سەلامەتن.. ئەی بۆ دانانیشی؟ هاکا پەیا ببنەوە!

زوبێر: نا کاکە گیان، جارێکیتر دێمەوە ئاساییە، سەلامی منیان پێ بگەیەنە.

هاوڕێ: وەی عەلەینا وەعەلەیکەل سەلام مامۆستا گیان

(( خواحافیزیی گەرمی هاوڕێ و ڕۆشتنی زوبێر))

Cut

دیمەنی – ٦٨٥ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز بە پێوەیە لە نزیکی کورسییەکەی، مفەوەز گەیلانیش بە پێوە.. گێلاس و ئاکۆش بە پێوە ))

بەهێز: بەداخەوە هیچمان بۆ نەکرا.. بەڵام گەر دەرکەوت ئەوەی کە گرتوومانە دزەکەی کوشتبێت، باشترەو هەنگاوێک ئەچینە پێشەوە.. پێ ئەچێ بۆ ڕێ ون کردن ئەوەی کردبێ، یان شەڕی نێوانیان بووبێ لەسەر ئەو پارەیە.. ڕاستیەکەی جارێ نازانین، نکوڵیی لەوە ئەکا ئەو کوشتبێتی.. چاوەڕوانی لێکۆڵینەوە بن.

گێلاس: جەنابی ئەفسەر تکایە هیممەت بکەن بۆ گەڕانەوەی پارەکەم، باوەڕ بکە نەگەڕێتەوە تیا ئەچم.

بەهێز: ئێمە جگە لەوەی ئەمانەوێ ئەو پارەیت وەک هاووڵاتییەک بۆ بگێڕینەوە، بەڵام کاری ئێمە زیاتر پاراستنی کۆمەڵگەیە لە خەڵکی خراپ، دۆزینەوەی تاوانباران و بە سزا گەیاندنیان بۆ ئێمە ئەرکی گرنگەو گەڕانەوەی پارەکەت چەند دڵخۆشت ئەکا، ئەوەش ئێمە.زیاتر دڵخۆش ئەکا.

ئاکۆ: ئیتر چاوەڕوانی جوامێریی ئێوەین.. ڕاستیەکەی ئێمە نەمانتوانی بیپارێزین.. سوپاس بۆ ماندووبوونی ئێوە، کە لە هەوڵدان بۆ گێڕانەوەو دۆزینەوەی تاوانبارەکە.

بەهێز: ئەوە ئەرکی ئێمەیە.. تەنها ئارام بگرن و هیچیتر.. بێزەحمەت بفەرموون لای ملازم ئاری، ناونیشان و ژمارەی کراوەتان جێبهێڵن (( خواحافیزی و سوپاسکردن و ئارامگرتن و ڕۆشتنی ئاکۆو گێلاس.. بەهێز زەنگی بەردەرگا لێ ئەدات و پۆلیس دێتە ژوورەوەو تحیة )) ئەوانی بەردەرگا با بێن.

پۆلیس(( تحیة و ئەچێتە دەرەوە )): بەسەرچاو گەورەم.

(( خدر٣ و هەڵشۆ دێنە ژوورەوەو بە دەست پێکردنی دیالۆگ، مفەوەز گەیلان ئەنوسێت ))

بەهێز: مفەوەز گەیلان بنوسە.

گەیلان: فەرمانتە گەورەم.

بەهێز: سمکۆ تۆ تاوانباری بە دزیی کردن، لە ڕێگەی خزمەکانتەوە، لە ماڵی ئەم پیاوە کە ناوی هەڵشۆیە.. ئەو خزمانەت کێ بوون کە ناردتنە سەر ئەو ماڵە.

خدر٣: قوربان ببورە من هیچ خزمم نییەو پیاوێکی سادەو بێکەسم، خەڵکی ئەو گوندانەی سەر سنورم، لە بێکەسییا هاتمە شارو پاقلەو نۆکاو ئەفرۆشم.. ئەم پیاوەش بە ژیانم نە بینیومەو نەئەیناسم و نە ئەشزانم ماڵی لە کوێیە.. بە هیچ جۆرێکیش نە کەسم بۆ دزیکردن ناردۆتە سەر ماڵی و نە دزیشم لێکردووە.

بەهێز: شایەت هەیە کە خۆت باست بۆ کردووە چۆن خزمەکانت ئەنێریتە سەر ماڵەکەی و چۆن پارەی فرۆشتنی قاوەخانەکەی ئەدزیت.

خدر٣: قوربان گیان، بیللاهی من پیاوێکی هەژارم و هاوڕێی کەسیش نییم لەم شارەیا تا قسەی وامکردبێ.. هەموو ئەو ڕیزە دوکانەی نۆکاوەکەی لە بەردەما ئەفرۆشم، ئەزانن کە من پیاوێکی چەند بێ وەی و بێ موزەڕەتم، ئیشی خۆم ئەکەم و چاوم لەدوای ماڵی کەسیش نییە.

بەهێز: یەعنی تۆ نکوڵیی ئەکەی ئاگاداری ئەم دزییە بیت؟

خدر٣: بەڵێ جەنابی ئەفسەر، بە هیچ جۆرێک ئاگاداری ئەم بەڵایە نیم ئەم کابرایە بەسەریا هێناوم.. زۆریشم پێ سەیرە نەدیو و نەناس یەخەی گرتووم.

بەهێز(( بۆ هەڵشۆ)): تۆ ئەم کابرایە ئەناسیت؟

هەڵشۆ: نەخێر گەورەم قەت نەمبینیوە، تەنها لەسەر قسەی شایەتەکە داوام لەسەری تۆمارکرد.

بەهێز: هەر سووریت لەسەر ئەوەی ئەم سمکۆیە دزییەکەی لێکردبیت؟

هەڵشۆ: گەورەم حاشاکردن بە دەمیی، بۆ خۆپەڕاندنەوەیە، شایەت هەیە کە نیەتی خۆی بۆ باسکردووە.. گەورەم من هیچم لەگەڵ ئەم پیاوەیا نییە تا ئەوکاتەی ساغ

ئەبێتەوە کە دزییەکەی لێکردبم.. ئیتر ئەوەش لای جەنابتە چۆن ناچاری ئەکەی دانی پیا بنێ.

بەهێز: کەواتە سمکۆ ئەچیتە لای دادوەری لێکۆڵینەوەو ئێستا سەلماندنی ئەوە لەسەر تۆیەو بە پێچەوانەوە تۆمەتەکەت بەسەرا ساغ ئەبێتەوەو ئەبێ ئەو پارەیە بگێڕیتەوە بۆ هەڵشۆی سکاڵاکار.

هەڵشۆ: ئەمە عەننابییە.

بەهێز(( زەنگی بەر دەرگا لێ ئەدا، پۆلیس دێتە ژوورەوەو تحیة)): بیانبە دەرەوەو مولازم ئاریم بۆ بانگکە.

پۆلیس(( تحیەوچوونە دەرەوە)): فەرمانتە گەورەم.

بەهێز(( بۆ گەیلان)): ڕەوانەی دادوەر بکرێ.

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٦٨٦ – متبوع – ڕ/ن – بەردەرگای بەهێز:

(( نارەوەن وەستاوەو هەڵشۆو خدر٣ دێنە دەرەوە))

نارەوەن: چی بوو؟ هەڵشۆ!

هەڵشۆ: عەننابییە.. ئەبرێت بۆ لای دادوەر با خۆی بیسەلمێنێ بێتاوانە!

نارەوەن(( بۆ خدر٣)): کاکە ئەگەر بێتاوانی خۆت ئەتوانی بسەلمێنی، هیچت بۆ نابێ.. من لە خۆوە هەست ئەکەم بێ تاوانی.

خدر٣: خوا ئەیزانێ بێ تاوانم.. ئەمە چی تۆیە خوشکێ؟

نارەوەن: بە خێرێ زاوامە.

خدر٣(( بۆ هەڵشۆ)): ئەرێ کاکە گەڕی چیت لە من ئاڵاندووە؟ وەڵاهی ئەگەر بە نیازی پارەی، من ئەوە نیم براکەم، هیچت دەست ناکەوێ.. ئەگەر شەڕی کۆنە قینت لەگەڵ من هەیە؟ بڕوا بکە بە ژیانم نەمبینیویی و بە هەڵەدا چووی ئەو کەسە من نیم.. ئیتر نازانم چیت لە من ئەوێ؟

هەڵشۆ: با سەری خۆمان نەیەشێنین سمکۆ.. دادگا هەیەو من هیچ قسەیەکیترم نییە.

نارەوەن: دەی خوا سرِی پیاوخراپ هەڵماڵێ و با دادگاش بە عەدالەت یەکلایکاتەوە.. من دڵنیام هەروا ئەکا، (( بۆ خدر٣)) ئێ خۆ کە بێتاوان بیت، دەرئەکەوێ، تاوانباریش بیت هیچ قسەیەک ناخوا.. دەی من ئیتر ئەڕۆم، هەڵشۆ بە هەر شوێنێک گەیشتن پێم بڵێ.

هەڵشۆ: بەسەرچاو نارەوەن خان خەمت نەبێ.. هیچ!

خدر٣: دادگا خۆی بڕیار ئەدات و تۆش ئەیبینی دادەگیان.. زۆر سوپاس، خواحافیزت بێ.

(( نارەوەن وەڵامی خواحافیزییان ناداتەوەو ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٦٨٧ – ڕ/ن – چێشتانەیەکی فاخر:

(( شەنیاو ئامۆ نانیان داواکردووەو بەرە بەرە بەدەم قسەیانەوە نانەکە دێت ))

شەنیا: بەداخەوە، چیرۆکێکی قورسە.. باوک لەدەستدان و بەو شێوەیە کارەساتە بۆ خێزان.. لە هەموو حاڵەتێکدا هیچ کاریگەرێتیی لەسەر ئێمە نییە.. بەڵام منیش چیرۆکێکی ئاڵۆزی خۆم هەیە ئامۆ، لەو بڕوایەیا نەبیت، هەر ئەوی خۆت کاریگەرە.

ئامۆ: هەڵبەت کەس بێبەریی نییە لە ڕووداو و چیرۆکی کاریگەر.. ئیتر هەر ژیان خۆی و بەوەی کە دێیتە ناو بوونەوە، سەرەتا بە ئازارەوە تلاننەوەیەو کۆتاییەکەشی کارەسات، دەی کەواتە چاوەڕوانی چی ئەکەی.. تۆش هیچ مەشارەوە!

شەنیا: نا تازە لەوەیا نەماوە هیچ لەیەکتر بشارینەوە!! هەهە

ئامۆ: پێمخۆشە.

شەنیا: خاڵم پیاوێکی چاونەترس و کەمێکیش تورەوترۆ بوو.

ئامۆ: هەر نەتدابێتەوە سەر خاڵت باشە (( پێکەنین ))

شەنیا: ئەوە خۆت حوکم بە.. زۆرجار توشی گێرەو کێشەو بێنەو بەردە ئەبوو.. باوکیشم هێمن و لەسەرخۆ.

ئامۆ: ئەمەیان هەواڵێکی زۆر خۆشە.

شەنیا: ئا.. زۆر هێمنە، بە جۆرێک ئەبووە قوربانیی بۆ کەسانیتر.. وەختە بڵێم هەمووان دڵە باشەکەیان قۆستبۆوە.

ئامۆ: ئەوە پێی فێر بوون ئازیزم.. لێرە نیشاندانی مەرامی دڵ و میهرەبانیی، بەردەوام زیانت لێئەدا.. نە حساب بۆ باشیت ئەکەن و نە پێی ئەزانن.. ئەوەندەیان لەسەرە کە ئیشیان پێت بوو، ئیتر بکەونە ڕیایی.

شەنیا: دەمخۆش.. بۆ نمونە خاڵم هەر هاتوچۆی نەئەکردین بە باوکمی ئەوت کچەکانت قاچ و قول ڕووتن.. کەچی کە تەنگەتاو ئەبوو، لەگەڵ باوکما ئەبوو بە کوڕی یەک دایک و باوک.

ئامۆ: یەکێ لەو شتانەی سەری پێ هەڵگرتم و وتم بچمە وڵاتێک کەس نەمناسێ، ئا ئەمە بوو.

شەنیا: ئەوەش چارەسەر نییە ئامۆ گیان، لەوێش مرۆڤ هەیە مرۆڤ.. ئەزانی مرۆڤ چییە؟ ئەها سەرو دەست و قاچی هەیە.. بەڵام بە ڕاگوزاریی ئەژی، بە قوڵیی بیر لە بوونی خۆی ناکاتەوە، ڕەنگە هەندێ لە بوونەوەرەکانیتر باشتر حاڵیی بووبن.

ئامۆ: ئا.. ئا لەزۆر شتا تێبینیم کردووە.. ئێ ئەوە خاڵ و باوکت؟!

شەنیا: نا هەر ئەوەنە نا، خاڵم ئێستا لە زیندان پاڵی لێداوەتەوە، هەر ئەخواو ئەخەوێ.. لەگەڵ ماڵەکەش ڕێککەوتن، کەچی دادگا تەنها حوکمەکەی سووککردو ئیتر وا بۆ خۆی جارێ لە بەڵاکانی بەدوورین.. گەر خوا بکا تاسەر بێ.

ئامۆ: خاڵتە! چۆن دڵت ئەیهێنێ وا بڵێی؟ سەیر نییە؟

شەنیا: لای من هەر کەسێک دەستی چووە خوێنی کەسێکیتر، بە دەستخۆم نییە چاوم نایبینێ، جا گەر بە ناڕەوا بێت ئەوە هەر زۆر زیاتر.

ئامۆ: خەڵکی کوشتوە؟

شەنیا: بەڵێ. ئەو شایانی سێدارە بوو نەک زیندان.. باوکم بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ ماڵی کوژراوا، خانووی بۆ فرۆشت و سەیارەو هیچمان نەماو پارەیەکی زۆریشی لەسەر قەرزار بوو.

ئامۆ: ئەی خۆی بۆ پارەکەی پەیا نەکرد؟ دیارە پارەکە زۆر بووە؟

شەنیا: زۆر زۆر بوو، هەر خوێنبایی کوژراوەکە نەبوو، چووبووە سەر دێی کوژراوەکەو دەغڵ و دانێکی زۆریشی سوتاندبوون.

دیمەنی – ٦٨٨ – ڕ/ن – ماڵی هەڵشۆ:

(( تریفە وەک ترساو لە پەنجەرەوە ئەڕوانێتە دەرەوەو بە پەلە پەردە دائەداتەوە، هەردوو دەستی لە ئەژنۆی جووت ئەکاو نیشانەی ترسێکی زۆر بە دەم و لێو کرۆشتن و چەناگە خستنە سەر ئەژنۆی نیشان ئەدا.. بە توندی لە دەرگا ئەدرێت و ڕائەچڵەکێ و ترسەکە زیاتر ئەبێ))

تریفە(( بە دەنگی لەرزۆک)): ئەوە کێیە؟

هەڵشۆ(( پێکەنین)): بیکەرەوە من دزم.

تریفە(( ئەچێ دەرگا ئەکاتەوە)): ئەک ڕەزات خواتەوە توخوا ئەوە سوعبەتە تۆ ئەیکەی؟ من خۆم وا زارەترەک ئەبم، تۆش لە بەزم و ڕەزمی خۆت ناکەوی.

هەڵشۆ: ویستم تۆزێ بتترسێنم، بۆ ئەوەی ئەو ترسەت بیربەرمەوە.

تریفە: وەڵا هەر تۆقیم، من ئەزانم خۆت کلیلت پێیە، بۆیە لەوبڕوایەدا نەبووم تۆ بی.

هەڵشۆ: ئاخر خۆت بێئەقڵ مەکە توتو گیان، ئەبێ کێ بەوجۆرە لەدەرگا بداو ئیشی چییان بەو لە دەرگادانە هەبێ؟

(( تریفە بەرەو ژوورێک ئەچێ))

هەڵشۆ: چیمان هەیە؟ وا مردم لە برسا!

تریفە(( دەنگی دێت)): تۆ جارێ مەمرە، پێنج دەقەیتر ئەیهێنم.

Cut

دیمەنی – ٦٨٩ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٨٨ – چێشتخانە:

(( شەنیاو ئامۆ))

شەنیا: ڕاستە.. بەڵام کێشەکە ئەوەیە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر من و تۆ دروست کردووە.

ئامۆ: سەیرە، ئەگەر کاریگەریی دروست بێ ئەبێ لای منەوە بێ، نەک تۆ.

شەنیا: لای منیشەوە نییە، دڵنیابە هەربەربەستێ هەبێ، من گوێی نادەمێ ئەمە نەبێ.

ئامۆ: چۆن؟ تێناگەم، خاڵ کاریگەرێتیی چی دروست ئەکا.

شەنیا: ئامۆ گیان خاڵم نا، باوکم.. باوکم بڕە پارەیەکی زۆر لەسەر ئەو بابەتە قەرزارە، تا من و باوکم نەیدەینەوە، نابێ هاوسەرگیریی بکەم.

ئامۆ: تۆ بۆ؟

شەنیا: منیش لە دوو شوێن ئیش ئەکەم، مانگانە ئەبێ خێزانەکە بەڕێوە ببەم و ئەوی باوکیشم پەیای ئەکا، بۆ دانەوەی قەرزە.

ئامۆ: باوکت ئیشی چییە؟ ئەوەی دەست ئەکەوێ قەرز سووککا؟

شەنیا: ئەندازیاری مەدەنییە، ئۆفیسیشی هەیەو بەڵێندەرایەتیش ئەکا، بەڵام هیچی بۆ ئێمە نییە، هەمووی خاوەن قەرز ئەیبا.

ئامۆ: قەرزەکە چەندە، منیش لەگەڵ دایکم ئاوای برام قسەیەک ئەکەم بەڵکو هاوکارییەکتان بکەم!

شەنیا: ئەوە تۆ ئەڵێی چی ئامۆ؟ مەحاڵە هیچ هیچت لێوەرگرم.

ئامۆ: شەنیا گیان پارەی من و تۆ یەکە، بەڵام پرسێکی ئەوانی ئەوێ، چونکە بە هاوبەشیی داهاتەکان کۆئەکەینەوەو کەس پارەی خۆی جیا نەکردۆتەوە.. من داوای

ئەوەیان لێ ئەکەم، دڵنیابە لە پارەی دانراومان دەرئەچێ و کەسیش منەت ناکا بەسەر ئەویترا.. ئەوەش بۆ ئەوەی زووتر هاوسەرگیرییەکە بکەین.

شەنیا: نا قبوڵ نییە.. پەلەمان چییە؟ یەک دوو ساڵیترەو ئەو سەدوبیست هەزار دۆلارەی لەسەرمانە تەواو ئەبێ.

ئامۆ: واو ئەڵێی خاڵت عەشیرەتێکی کوشتووە؟!

شەنیا: کاشکای توشمان بە توشی عەشیرەتێکەوە بووایە، نەک ئەوماڵە دڕندەیە.. باوەڕ ئەکەی هەڕەشەی فڕاندنی من و خوشکەکەشمیان کردبوو.. هەر باوەڕ ناکەی دەغڵ و دانەکەیان بە چ پارەیەک خەملاندبوو؟

ئامۆ: بەڕاستیی پارەکە زۆر زۆرە، داواکردنی لە دایکم تۆزێ قورسە.. تۆ بچۆرەوە قسەیەک لەگەڵ باوکتا بکە، من هەوڵ ئەدەم داوای سێیەکی لە دایکم و ئاوا بکەم، ڕەنگە لە دواییدا بتوانم هاوکارییتریش بکەم.

شەنیا: نەبابە چۆن ڕووزەردیی بۆ تۆ دروست ئەکەم؟ هەڵەی خاڵمەو ئەبێ خۆشمان باجەکەی بدەین.

ئامۆ: پێموتی تۆ باسی هاوکارییەکەی من لەگەڵ باوکتا بکەرەوە.. بەڵکو تەنها ئەوەندە بخاتە پێی تۆو ڕازیی بێت بە هاوسەرگیرییەکە.. گوزەرانی خێزانەکەش مەسەلەیەک نییە، خۆمان بە باشترین شێوە بەڕێوەی ئەبەین.

شەنیا: ئاخر!!!

ئامۆ: هیچ ئاخرێکی تیا نییەو من ئەمشەو ئەو پێشنیازە لە ماڵەوە ئەدرکێنم و سبەی وەڵامت ئەدەمەوە، دڵنیام ئەوانیش کێشەیان نابێت.

شەنیا: بۆ داهاتوومان جوان نییە ماڵی ئێوە لە ئێستاوە بزانن تۆ پارەی قەبەم ئەدەیتێ بۆ ماڵی باوکم.

ئامۆ: تۆ ئاوام لێ ڕائەبینی شەنیا گیان؟ من چۆن ناوی تۆو ماڵی باوکت ئەهێنم؟ ئەڵێم ئیشم پێیەتی و تەواو.. ئەوانیش پرسیار ناکەن ئیشەکە چییە دڵنیابە.

شەنیا: نازانم بڵێم چی؟ شەرمەزارم!

ئامۆ: ئەوە قسە نییە تۆ ئەیکەی گوڵشەنیا.. من هی خۆتم بەساقەوبم، هەموو ئەوەشی کە هەمە هەر هی خۆتە.

شەنیا: سوپاس، پێ ئەزانم ئازیزم.. با قسەیەکی لەگەڵ بکەم، بزانم ئەو ڕای چۆنە، بەڵام باوەڕ بکە قبوڵی ناکا.

ئامۆ: قبوڵکردن و نەکردن نییە، ئەبێ تۆ ڕازیی بکەیت، من بەیانی ئەوەم لە تۆ ئەوێ.

شەنیا(( هەر شەرم ئەکاو سەردائەخا)): سبەی هەرچی بوو، بۆ یەکتری باس ئەکەین.

(( سەرقاڵی نانخواردن و تیلە چاوگرتنە یەک و جاروباریش دیالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٦٩٠ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و شۆڕش دانیشتوون.. نینا لەپێشەوەو ئاوا بەدوایا دێنە ژوورەوە))

شۆڕش: دڵی خۆت تەنگ مەکە، بەڕاستیی تاوانبار چەند زیرەک بێ، لە ئاستی پۆلیس و ئاسایشدا نەزانە.. ئیتر ئەوە بەردەوام سروشتی تاوانبارەکانیشە، کە شتێک جێ ئەهێڵن بۆ ڕێبردنەوە سەریان.. خەمت نەبێ خوشکەکەم.

ئاوا(( گوێ پێنەدان)): ئەوە چییە گێلاس خان؟ نا ئومێدمەبە، هەر نەشدۆزرایەوە نەدۆزرایەوە، کوڕی خۆت ئەتخاتەوە سەر سکەی خۆت و ناهێڵێ لە هیچت کەم بێ.. لە ئێستەوە هەموو خەرجیی ڕێستۆرانتەکە لەسەر من و قازانجەکەشی بۆ تۆ.. من ناهێڵم پەکی بکەوێ. ئوتێلیش خۆی خۆی بەڕێوە ئەبا.

گێلاس: وا سەری مانگەو کرێ نزیک بۆتەوە ئاوا گیان، تۆ بڵێی فریای ئەوە بکەوین؟

ئاوا: تۆ دڵت هیچ نەکا گێلاس خان، کرێی ئەم مانگەت لەسەر من.

گێلاس: نا نا نا ئەوە قبوڵ ناکەم ئاوا گیان، ئەگەر شتێکی کەم بوو ئەتوانی تەواوی بکەیت و من پێش کرێی مانگی داهاتوو ئەوە دائەنێمەوە.. بە گۆڕی باوکی هەردووکمان لەوە زیاتر قبوڵ ناکەم.

ئاوا: کێشەمان نییە، هەرچیەکت پێویست بوو، بە دڵی خۆت ئەوە ئەکەم.. (( پێکەنین)) ئەگەر پارەکەش دۆزرایەوە شەریکین هههههه.

گێلاس: کورە خوا ئەکا ئەدۆزرێتەوە؟!

نینا: منیش پارەم بۆ سەیارە کۆکردۆتەوە پورە گێلاس، لە خزمەتتایە هەر هەمووی (( ئاوا بە ئاماژەی ڕوخسار تێی ئەگەیەنێ کە قسەکەی هیچ نەبوو، پارەکە هەڵگرێتەوە بۆ خۆی))

گێلاس: ڕەبی پورت لە دەورتگەڕێ نینا گیان بەقوربانت بم، پەک ناکەوێ ئیشەڵڵا.

ئاوا(( وەک توانج)): ئیتر چیت ئەوێ پورێ گیان؟ هەموو لە خزمەتداین.. نیناش!!

نینا: پورێ گیان پارەکەی من زۆر حەڵاڵە، وەک پارەی خەڵک نییە بە هەلقۆستنەوەو ڕووتاندنەوەی خەڵک دەست کەوتبێ.

ئاوا(( دیقەتی قسەکەی ئەدا)): بەخوا پورێ پارەی کاسبی حەڵاڵترە، پارەی کاسبیش هەروا پەیا ئەکرێ.. خۆ لە پارەی منداڵێک باشترە بە دەخیلە کۆیکردبێتەوە. هەهە

نینا(( لچ هەڵقورتان لە ئاوا)): پورێ گیان پارەی منداڵ باشترە......

گێلاس(( بێزار، قسەکەی پێ ئەبڕێ)): دە توخوا سوعبەت بەسە، خۆم وا خەریکە مێشکم ئەتەقێ!

ئاوا: ئاخر پورێ گیان بۆ ئەوەی دڵت خۆشکەین و خەمی لێ نەخۆی! ئەگینا من و نینا خان، کەی سوعبەتمان کردووە.

شۆڕش: کات و ناکات بزانن باشترە.

نینا: باوکە گیان ئەمە هەروایە، قەت گوێ بە هیچ ناداو کات و ناکاتی لانییە.

ئاوا(( شاردنەوەی خەندە)): سوپاس بۆ ئامۆژگارییەکەت، بە خۆما ئەچمەوە.

نینا (( وەک بڵێ ئاوات لێ ئەکەم)): ئاوا!!

ئاوا: سوپاس.

شۆڕش (( تووڕەی سوعبەت)): ئێستا ئەیبڕنەوە یا هەستم بۆتان؟

گێلاس: خۆت سەغڵەت مەکە شۆڕش گیان، ئیتر ئەمە بەزمیانە هەرکاتێ یەکتر ئەبینن.

(( نیناو ئاوا لەیەک کەمێک دوور ئەکەونەوەو دیالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٦٩١ – ڕ/ د – شوێنێک:
(( میری گەورە ڕوخساری دەرناکەوێت، تەنها شان و لایەکی گوێچکە.. تێل ئەکا))
میر: ١- گەیشتنە چی پاشا؟.......... ٢- کەواتە کابرایەکی پاکەو هیچ پەیوەندییەکی بە دەزگاکانی حوکمەتەوە نییە.......... ٣- ئێ، ئەزانم ............. ٤- هەی ئافەرین.. تەواو پاشا لێی دڵنیابە.. سبەی با تەنازول بکرێ لە سکاڵاکە، حەتمەن سمکۆ حاشا لە شایەتیەکەی شاموراد ئەکاو بەڵگەیەکی بەهێزیش نییە تا بەسەریا ساغ بێتەوە، ڕەنگە هەر لای دادوەری لێکۆڵینەوە بە تەنازولەکە، دۆسیەکە دابخرێ.. با زۆر لە تەوقیفا نەمێنێتەوە، نەک ڕق هەڵگرێ، کاتێ ئەتبینێ.. بە تایبەت دوو سبەی جومعەیەو تەوقیفەکەی زۆر ئەخایەنێ........ ٥- پەلە مەکە، هەر کاتێ خۆم پێموتی، دەست پێ بکە......... ٦- پاشا یەکجاریتر باسی ژمارەم بکەیتەوە، بە دەردی ئەوانیترت ئەبەم، تێگەیشتی؟............ ٧- سەد جارم وت من سیمکارتی جێگیرم نییە (( مۆبایل ئەخاتە ژێر تایەی سەیارەکەیەوەو بەسەریا ئەڕوا))
______________ Cut ________________

دیمەنی – ٦٩٢ – ڕ/ د – شوێنێک:
(( پاشا ڕوخساری دەرناکەوێ، بە هەمان شێوەی میر))
پاشا: ١- میرم دادوەری لێکۆڵینەوە چوار ڕۆژ تەوقیفی کردو ئەدرێت بە دادگای کەتن ........... ٢- بەڵێ وا دیارە میری گەورەم.. شایەتەکەی کە شایەتی لەسەردا، باسی منی بۆ کردووەو بە مۆبایلی ئەو قسەی لەگەڵ کردم، ناوی شامورادە، برای ڕێشارەکە.......... ٣- وتم ئێستا هیچ نەبێ لای من هەڕەشەیەک لە شاموراد ئەکا، کە بە نهێنی ئەو و پاشا ئەزانێ و لای دادوەر باسی ئەکا، کەچی هیچی نەوت لەوبارەیەوە، تەنها پێی سەیر بوو........... ٤- ڕاست ئەفەرمووی میری گەورەم.. سبەی تەنازول پێشکەش ئەکرێ و ئیتر ڕێگەی یەکتر بینین ئەچنین............ ٥- فەرمانتە میری گەورەم.. ئەی ژمارەیەکی وات نییە بتوانم قسەت لەگەڵ بکەم؟ زۆر شت دێتە پێشەوە پێویستیم بە ڕێنمایی جەنابتە، نازانم چی بکەم؟............... ٦- بەڵێ میری گەورەم ببورە............ ٧- زۆر ببورە میری گەورەم دواجارم بوو ببورە.
(( سواری سەیارەیەک ئەبێت کە دووانیتری تیایە، بە بێ ئەوەی ڕوخساری هیچ کەسێک نیشان بدرێ)).
______________ Cut ________________

دیمەنی – ٦٩٣ – ش/ن – ماڵی بروسک:

(( چیمەن سکی تەواو بەرزە لەگەڵ باوکی دانیشتوون))

زوبێر: ئەوە هی ئەوەیە شتێکم دەربارەی دەروونزانی خوێندۆتەوە.. تۆ ئەزانی من ئێستا لە سەلماندنەوەی خۆمدام؟ ئەویش بێ ئەوەی پێ بزانم هەندێ میکانیزمی بەرگری لەخۆکردنم لە گەشە کردنان.. هههه خۆشم پێم سەیرە بۆ ئەمەوێ بەوجۆرە هەڵکشێم، کە ژیانی ڕابردووم بێ بایەخ بکەم لەچاو ئەوەی نیازم هەیە بیکەم.

چیمەن: تۆ هەروا بوویت باوکە گیان، بەردەوام ئەوی ئەیکەیت لەوی پێشووت باشترە.. پێت سەیر نەبێ هەمووشمان واین.

زوبێر: ڕاستە! ئەوی ئێوە دەرەنجامی بەری کارەکانی پێشترە.. بەڵام ئەوی من بۆ خۆسەلماندنە، کە زوبێر تاوانبار نییەو ئەتوانێ ئەمەش بکا.. ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو کە دەرەنجامی بەری کارەکانی پێشووتر بوو، بەڵام ئەمجارە نا.. ئەمجارە خۆم داڕێژەری ئەبم و بە جۆرێکیتر ئەتانپارێزم.. ئەوەش ئەبینی کچم.

زوبێر: خوا تۆمان بۆ بهێڵێ باوکە گیان.. کەواتە بە دڵی خۆت.. هەرشوێنێکت پێ خۆشە لەوێ بژی.. من سبەی لەم دەوروبەرە بۆت ئەگەڕێم بۆ خانوویەک.

زوبێر: نا کچم، بەو هەموو ورگەوە گەڕانی چی؟ لەگەڵ کوڕەکان نوسینگەکانی ئەمناوە ئاگادار ئەکەینەوەو گەر هەبێ، خۆیان پێمان ئەڵێن.

چیمەن: ئەی بۆ ئیش، چی ئەکەیت؟

زوبێر: با لە شوێنێک جێگیر بم.. ئەوسا بە هێمنیی بیر لە ئیشیش ئەکەمەوە.

(( دایالۆگ لە میوتیدا، یان بۆ یەکێکیان چوونە ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ٦٩٤ – ش/ن –ماڵی تایەر، هۆڵی گشتیی:

(( باوکی حەمەتایەرو شەماڵ و برزو و ئاکار دانیشتوون.. هاوکاریش پاش ماوەیەک دێت و لە کاتی خۆیدا سڵاو و بەخێرهاتن))

ئاکار: پارێزەرەکەی زۆر زیرەکە، ئەڵێن دایمە سەرکەوتوو بووە، ئیتر مەگەر شانسەکەی ئێمە.

باوک: بەساقەتان بم پشتی بەرمەدەن، (( گریان)) ئیتر ئێوە لەبری کوڕەکانمن.

شەماڵ: ئێمە کوڕی تۆو برای تایەریشین مامە گیان ، چۆن پشتی تێ ئەکەین؟

(( هاوکار دێت))

باوک (( بۆ هاوکار)): کوڕم هیچت دەسکەوت؟

هاوکار: ئەوەندەم زانی جارێ بەڵگەی تاوان وەڵامی دەمانچەکەی نەداوەتەوە، بەڵام ئەڵێن ئەو فیشەکەی لە سەری کوژراوەکەیا دەرهێنراوە، جیاوازە لە گوللەی دەمانچەکەی حەمەتایەر.

باوک: ئەک بە قوربانت بم ئەمە بەڵگەیەکی باشە.

برزو: ئا ئەمە (( ئاماژەی شەماڵ ئەکا)) بیهێشتایە ئێمەی لەگەڵ بین، قەت نەمانئەهێشت ئەمە ڕووبدا.

باوک: دەی ئەوەی چوو، لە دووی مەچن.. هەر دوعای خێری بۆ بکەن و بڵێن خوای گەورە لە ڕەحمی بەرینی خۆی بێ بەشی نەکا.

(( هەموو: ئامین))

__________ Cut __________

دیمەنی – ٦٩٥ – ش/ن - باخی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و ئامۆو ئاوا دانیشتوون و دواتر تیرۆژ چا ئەهێنێت و دائەنیشێت ))

نارەوەن (( بۆ ئامۆ )): کوڕم باشت کرد باسی هەموو شتێکت کرد.. خۆتان ئەزانن خەڵک جۆراوجۆرن، ناکرێ تۆ بە متمانەوە تەماشای هەموویان بکەی.. من ئەزانم شەنیا وەک پەڕەی گوڵ وایەو زۆر پاکە، شایانی هەموو شتێکە.. من پێم باشە، نەک یەک لەسەر سێ، هەموو پارەکەشی بۆ بدەیتەوە.

ئامۆ: سوپاس دایە گیان، هەر ئەوەم لێت ڕائەبینی.

ئاوا (( ئەدا بە شانی ئامۆدا )): بڕۆ قەپات ئیتر چیت ئەوێ؟ خۆزگەمان بەخۆت.. دیارە ئەوەی ئێمە جوان نییە، بزانە هیچی ئەداتێ ؟ هههه.

ئامۆ: هها تۆش داوایکە بێ ئەقڵ هههه.

نارەوەن: من بۆ هیچ شتێک دەست نانێم بە ڕووتانەوە، بەڵام ئێوە گەنجن و ئەزمونێکی واشتان نییە، نیەتەکان بناسنەوە.. من پێشنیازێک ئەکەم ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ؟

ئامۆ: پێشنیازی تۆ ئەمرە نارەگوڵ گیان!!

نارەوەن: بە قوربانت بم.. تەنها بزانە ماڵی لە کوێیەو ئیتر هەقت بەسەر هیچ شتێکەوە نەبێ.. من سۆراخی تەواویان ئەکەم و پێت ئەڵێم ئەو مەسەلانەی لای تۆ باسی کردوون، ڕاستەقینەن.. یان بۆ پارە لێکێشانەوەت هاتووە، کە بڕوا ناکەم وابێ.

ئاوا: کچێ دایە پارە لێکێشانەوەی چی؟ داماوە ئەڵێی فریشتەیە!

(( تیرۆژ دێت ))

ئامۆ: من قبوڵمە، لەبەرئەوەی دڵنیام لە ئەنجامەکەی. دڵنیام دایکیشم دڵخۆش ئەکا.

نارەوەن: هەموو بە دوای ئاسوودەییا وێڵین.

تیرۆژ: ئینجا سەرەمە؟

نارەوەن (( بێزار)): سەرەی چی؟ شوو؟

تیرۆژ: ئەوە دایکە تۆ بۆ بە قسەکردنی من گرژ ئەبی؟ چ شتێکی خراپت لە من بینیوە، ئاوا سووک سەیرم ئەکەی؟ دە وا بزانە منیش کوڕم، نابێ؟

نارەوەن: با دەمت نەکوتمەوە، تۆزێ جون قسە بکە.

ــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ــــــــــ Cut ــــــــــ

دیمەنی – ٦٩٦ – ش/ن – ماڵی دڵنیا – ژووری دڵنیا:

(( دڵنیا سەرقاڵی مۆبایلەو پێکەنین و خەندەی گاڵتەجاڕیی هەیە.. پاش کەمێک ئارەزووی خوشکی، کچێکی تەمەن نزیک ١٦ ساڵ دێتە ژوورەوە، عەیارو هارو هاج.. خۆی بۆ دڵنیا هەڵئەدات و ئەیخا، ئەویش یەک دوو چەپۆکی پیائەکێشێ))

دڵنیا: ڕوحت بردم یاخوا داوەشێی، ئەوە تۆ چیت.

ئارەزوو(( هەڵئەسێ و تەمسیلی خێوی بۆ ئەکا)): من خێوم خێو، هەر ئێستا ئەتخۆم. هههە، ئەوە عەیب نییە لە ماڵی خۆمانا بترسی؟ هەستە هەستە دەی نان حازرە.

دڵنیا: ئارەزوو گیان بچۆ بڵێ جارێ نا، کەمێکیتر بەڵێن بێ خۆم دێم.

ئارەزوو: من تاقەتی گێچەڵی تۆو شەق وەشاندنی کاکەم نییە.. ئێستا ئەچم ئەڵێم کاکە نایەت. (( هەڵئەسێ بەرەو دەرگا بچێت))

دڵنیا: بۆ مڵۆزمەکە لە ماڵە؟

ئارەزوو(( بەڕابواردنەوە)): ئارێ بەوخودایەی چاوەڕوانی تۆیە، هەستە دڵەکەم ئەگینا من ئەڕۆم.

دڵنیا(( پەلەپوزەی تێ ئەکەوێ)): یەك دەقە بەساقەوبم ئارەزوو گیان مەڕۆ، ئەها ئەهـ.

ئارەزوو: ئەوە ئەو پەلە پڕووزێیەت لە چییە؟ ئەوەندە لە شەقی ئەترسی؟ هههە.

(( دڵنیا مۆبایلەکەی دائەنێ و ڕاوی ئەنێ))

Cut

دیمەنی – ٦٩٧ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٦٩٥ –باخی ماڵی نارەوەن:

(( ئامۆو ئاواو نارەوەن و تیرۆژ))

ئامۆ: فەرموو تیرۆژ گیان چیت لەدڵایە هەڵیڕێژە.

ئاوا(( بە ئاوازەوە)): چی لە دڵتایە تیرۆژ، بۆ منی هەڵڕێژە هههە.

تیرۆژ: توخوا کەمێک گوێم لێ بگرن، ئاخر منیش هەر خوا دروستی کردووم و بەشەرم.. خۆ زۆرم حەز ئەکرد کوڕ بوومایە.. ئێ چی بکەم بەدەست من نەبوو، هەر پرسیشم پێ نەکراوە.

نارەوەن: دە بەسە چەڵتە چەڵت دەی!!!!.. چیت هەیە بیڵێ و ببڕێتەوە.

تیرۆژ: خۆ گوێتان لێیە، ئەها چۆن دەستی ڕێز ئەخاتە سەرم؟ ئەوە ئەگەر خۆشم بکوژم، ئینجا فینگە فینگ بۆم ئەگری.

ئامۆ: نارەخان ڕێی لێ مەگرە، با بزانین چی پێویستە؟

تیرۆژ: هیچم پێویست نییە کاکە ئامۆ.. تەنها ئەوەندە نەبێ هەست ئەکەم چواردیواری ماڵەکە بەرەبەرە دێتەوە یەک و وەک ناوگۆڕ گۆڕەوشارم ئەدەن.

نارەوەن(( هەڵئەسێ و پێکەنینی گاڵتەجاڕانە)): ئازادی ئەوێ هههە ئەوە بۆ ئێوە، من تاقەتم نییە گوێی لێ بگرم. (( نارەوەن ئەڕوا))

ئامۆ: دەی ئینجا بە ئیسراحەت قسە بکە.

تیرۆژ: ئێوە نازانن چەند بێ بایەخ سەیرم ئەکا.. هەروەک ئەوەی مرۆڤیش نەبم.

ئاوا: دەی گوێ مەیەرێ تیرۆژ گیان، پیر بووەو ئیتر دەرەقەتی ئیش نایەت، خۆ ئەبێ بە یەکێکی بڕێژێ، ئەوەش شانسی خۆت هەهە.

تیرۆژ: وەڵا ڕێک وایە.. کاکە گیان من زانکۆم تەواو کردووەو ئیتر پێویستیم بە ئیش و چوونە دەرەوەیە، هاوڕێی من هەموو کە قسەیان لەگەڵ ئەکەم لە کۆمپانیاو شتی وا دامەزراون و ئیتر ڕاست یا درۆ، خۆیان خەریک کردووە بە ئیشێکەو منیش لە دوو سێ

کۆمپانیا هەر بەشم ئەوەبێ لە بەیانییەوە بۆ نیوەشەو لە سنوری چواردیواراو بۆڵە بۆڵی دایکیشم لەولاوە بوەستێ.. بەراستیی ئەگەر تا نیوەڕۆ لەسەر ئیشێک بم، هەرچیەکیشم پێ بکا، گوێی نایەمێ.

ئامۆ: هەر ئیش و هیچیتر؟ هیچت پێویست نییە؟

تیرۆژ: لە هیچم کەم نییە کاکە.. بەڵام لەماڵەوە خەریکە ئەخنکێم!

ئامۆ: باشە گوڵی کاکەی، خەمت نەبێ.. من بەخێرایی وا ئەکەم ئەم کێشە گەورەیەی تۆ، کە هەر هیچ نییە، چارەسەریکەم، بێخەمبە تیرۆژ گیان.

ئاوا: ئەمە بوو هەموو خەم و مەراقەکەت؟ جا ئەوە چییە وا خۆت بۆ سەغلەت کردووە؟.. بەیانی وەرەو لای من ئیش بکە.

تیرۆژ: جا لای تۆ ئیشی چی هەیە؟

ئاوا: دەست ئەدەیتە چ ئیشێک بیکە، خۆت خاوەنماڵ بە.

تیرۆژ: نا.. من ئەمەوێ لە شوێنێک بم نەبمە سەربارو منیان لێ زیاد بێ.. شوێنێکم ئەوێ ئەگەر من نەبم پەکیان بکەوێ.

ئامۆ: هەی زۆرزان!! باشە هەوڵ ئەدەین.

((لە میوتیدا دایالۆگ))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٦٩٨ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( خدر٣و مفەوەزێک و بەهێز لە جێی خۆی دانیشتوون))

بەهێز: بەڵێ دۆسیەکەت داخرا.. لەبەرئەوەی تەنیا شایەتێک بەس نییە بۆ سەلماندنی تاوانێک، کە تۆ نەچوویتە ژێر باری قسەکەشیەوە.. جگە لەوەش خۆی دەستی لە سکاڵاکەی هەڵگرت.. بەڵام لە زۆر باردا هەر ئیفراج ئەکرای.

خدر٣: بەخوا قوربان شایەتیەکە هەڵبەسراو بوو، بە ژیانم بیرم لە دزیی نەکردۆتەوە.

بەهێز: لە هەموو حاڵەتێکدا برۆ خوات لەگەڵ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر٣))

Cut

دیمەنی – ٦٩٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( نیناو گێلاس))

نینا: زیاتر لە سەعاتێک قسەی بۆ کردم.. بە کورتیی دوێنێی ئێمەی زۆر پێ ناخۆش بوو.

گێلاس: بەڕای من ڕای تۆ، لە پێش ڕای هەمووانەوەیە.. ئیتر بە دڵی خۆت بکەی باشترە.. تۆ ئەوەی باوکی و تەقەلێکردن و ئەو شتانەت تێ پەڕاند؟

نینا: بەڵێ، ئەوە ئاساییە، گرنگ ئەوەیە ئەم تاوانبار نییەو دیاریشە خەریکی چییە، باوەڕ ناکەم کەس دەست بهێنێتە ڕێگەی ئەم.

گێلاس: بەلاّم سەرەتا زۆر بە قورسیی وەرتگرت؟!

نینا(( پێکەنین)): هەر زۆر زۆریش، سەری دنیام لێهاتەوە یەک، وامئەزانی هەر بچمە ئەو ماڵەوە ئەکوژرێم.. دوایی وردە وردە بۆم دەرکەوت، لە وەهما ئەژیام.

گێلاس: جا با پێت بڵێم.. ئەو خۆی وتی هەر لە ڕێوە، ئەو شتانەت پێ بڵێم (( نینا واقی وڕ ئەمێنێ)) تا دووایی کە بیستت توشی شۆک نەبی و شتەکان هەڵوەشێنیتەوە.

نینا(( دەست ئەگرێ بەدەمییەوە)): وای کە زۆرزانە.. تۆش قسەت نەکرد؟!

گێلاس: سوێندیدام کە پێت نەڵێم خۆی پێی وتووم..دەی ئێستا تۆ وەک خۆت ئەڵێی چی؟

نینا: بە چاوی تۆ پورێ خۆم نازانم باشە یان خراپ، بۆیە هەر دوای ئەخەم و ناهێڵم زۆر بێتە پێشەوە.. وەک ڕووکەش خراپ نییە، ئیتر خۆ مرۆڤەو مرۆڤیش وا ئاسان نییە بە بینین بڕیاری لەسەر بدەی.

گێلاس: هەرکاتێ زانیت خۆت خۆشت ئەوێ و بەدڵتە، باوکت لەسەر من.

نینا: نا پوریێ گیان دەستت ماچ ئەکەم سوپاس.. لای من تا ئێستاش ئەوە ناهێنێ باوکمی بۆ نیگەران بکەم.. هاوڕێیین و سوعبەتمان هەیەو هیچیتر.. با هەروا بێ، گەر باوکم ڕای گۆڕی، منیش ئەوسا بیری لێ ئەکەمەوە.

گێلاس: من بەختەوەریی تۆم ئەوێ و هیچیتر کچەکەم.. هەرچیت پێ باش بوو بە پوری خۆت بڵێ و من ئەوە بکەم.. ((لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٧٠٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( شەنیاو ئامۆ))

شەنیا: هەرچەند زۆر ڕەتیکردەوە، بەڵام من زۆرم لێکردو ڕازیم کرد.. ئەوسا وتی با ببیینم.

ئامۆ: ئۆو چەند باشە ئەو بینینە، لەو بڕوایەدام هەر بمبینێ ڕازیی بێ.

شەنیا: ئەوەندەش لەخۆڕازیی مەبە!! ڕاستە من دڵم بە تۆیا داهێناو پێت ڕازیی بووم، کە هیچ کوڕێک ئەو چانسەی پێ ڕەوا نەبینرا.. بەڵام کێ ئەڵێ ئەو حاڵەتە نەشاز نییە هههە.

ئامۆ: یەعنی ئەوەندە ناشرین و دزێوم، ڕازیی بوونەکەت نەشاز بوو؟.. خەتای خۆمە وامنەکرد سێ چوار مانگیتر دوامکەوی ئینجا ڕازی بم. هههههە.

شەنیا: پێمەکەنە، بڵێم چی بە یەکەم بینینت دڵم داخورپاو جێی خۆت کردەوە.. ڕاستە دوو مانگ دوات کەوتم تا تۆش شتێک بڵێی.. بەڵام ئامۆ یەکجاریتر بیدەیتەوە بە ڕووما، نامبینیتەوە، با باش بزانی.

ئامۆ: ببورە، باوەڕ بکە هەر لە چوارچێوەی سوعبەتەکەی تۆیا بوو.. زۆر ببورە مەبەستم ئەوە نەبوو دوامکەوتبی، بابە من تا مردن دوات ئەکەوم، باشە؟ هههە

شەنیا(( خەندەی کورت)): ئەمجارەیان ئەبوورم، بەڵام جاریتر نا، تێبگە!

ئامۆ(( هەردوو دەستی وەک تەلەبەی ئاقڵ لەسەر سنگی ئەخاتە سەر یەک)): تۆبە تەواو!.. تۆ پێم بڵێ، بۆ مانگەکە چی وت؟

شەنیا: وتی مانگێکیتر کەمە، مادام ئەزمونی خۆشەویستیت نییە، تا تەواو هەڵی نەسەنگێنی شتی وا مەکە.

ئامۆ: بۆ بە خێرێ پێتوت هەڵمنەسەنگاندووە؟

شەنیا: نا چۆن شتی وا ئەڵێم! بەڵام هەر زۆر زووە ئامۆ گیان، با ماوەیەک بخایەنێت.. من و تۆ هیچمان ئامانجمان هاوسەرگیریی نییە تا پەلەمان بێ، ئێمە لەوە زیاتر تێگەیشتووین چوونە ژێر سەقفێک ئامانجمان بێ.

ئامۆ: ڕاستییەکەی پەیوەندییەکە شیرینترە لە هاوسەرگیریی، بەڵام بە دایکمم وت مانگێک، ئەزانی؟

شەنیا: بەڵی بیرمە.. بەڵام باوکیشم گوناحە، با لەلای ئاسایی ببێتەوە کە ئەڕۆم، ئەوسا بڕیارەکە ئەدەین.

ئامۆ: کە هاوسەرگیرییەکەمان کرد، هەموو قەرزەکەشتان بۆ ئەدەمەوە.

شەنیا(( گرژ)): توخوا هەموو شتێک مەبەرەوە سەر پارە ئامۆ گیان.. من زۆر ڕقم لە پارەو ناوهێنانیەتی.. ئەو قەرزەش هەر ئەدرێتەوە، مەیکە بە مەرج بۆ هاوسەرگیریی، پێم ناخۆشە بەساقەوبم، بە هەڵە لێم تێمەگە.

ئامۆ: نا من ئەمەوێ ئەوەندە ئاسوودەبیت، خەیاڵت بە هیچ لایەکیترا نەچێ خۆم نەبێ.. پارە هیچ نییە، لەبەر پێتایە.. ئەرێ باوکت لە کوێ ئەبینم؟ ماڵەوە؟

شەنیا: ئەوە دوایی ڕێکئەخەین، لە هەر شوێنێ پێی خۆش بوو.

ئامۆ: ئەی ماڵتان لە کوێیە؟ ناونیشانەکەم وا بدەرێ ڕێک بێمە بەردەمی ماڵەکەتان.

شەنیا: ئەمە بۆ؟

ئامۆ: باوەڕ بکە زۆر ئێوارە ئەوەندە بیرت ئەکەم خەریکە پەڕوباڵم لێ بڕوێ.. ماڵەکەتان بزانم و هەر بە بەردەمیشیا بێم و بڕۆم سوکناییە.

شەنیا: نا نا تا پەڕوباڵت لێ نەڕواوە ناونیشانەکەیت بدەمێ باشترە، بەڵام هەرکات بیرت کردم، تێلێکم بۆ بکە ئەگەمە لات.. بنوسە: .......................(( ناونیشانی لە میوتیدا ئەداتێ، ئامۆ قەڵەمەکەی ئەگرێ بەدەستیەوەو لەسەر کاغەزێک ئەینوسێ))

Cut

دیمەنی – ٧٠١ –ڕ- ئێوارە /ن - ئۆفیسی شۆڕش:

(( شۆڕش و سەردار دانیشتوون))

شۆڕش: کاکە ئەمانە لە تۆڕێکی گەورە ئەچن، پێش ئەوەی پۆلیس بگاتە سەریان، کابرای دزەیان کوشت.. باشە بە چیدا زانیان کوڕەکەم ڕەسمی دزەی کێشاوە.. خۆ لە خۆمان زیاتر یەک کەس نەیزانیبوو.

سەردار: نا لەوانەیە هیچ پەیوەندیی بەوەوە نەبێت، هەر بۆ ئەوە کوشتبێتیان نهێنییەکەیان بشارنەوە.. ئەوە لە فیلم و ملیمەوە فێر بوون کاکە.

شۆڕش: ئیتر پیاو نازانێ بڵێ چی، ئەگەر پۆلیس نەیدۆزێتەوە، کە باوەڕم نییە بشدۆزرێتەوە، ئاوەو ئاو تیاچوو.

سەردار: ئەی لەگەڵ ئەو هەتیوە گەیشتییە کوێ؟ پارەکەت دایەوە؟

شۆڕش: ئای سەردار چۆن گیرم خواردووە بەدەست ئەو هەتیوەوە.. کچەکەشم وەک من نازانێ چی لێ بکا تا لێی دوورکەوێتەوە.

سەردار: چۆن؟

شۆڕش: زۆر سەرەڕۆو بێ شەرم و شکۆیە.. بەبەرچاوی منەوە ئەکەوێتە سوعبەت لەگەڵیا.. ئاخر ناڵێ ئەمە باوکیەتی و پێی ناخۆشە.. نازانم چۆن دووری خەینەوە.

سەردار: ئەگەر کچەکەش بە دڵی نییە.. پێی بڵێ کچەکەت نادەمێ و خۆت ماندوو مەکە، ئەوە دوا بڕیارمانە.

شۆڕش: کاکە خۆی کردووە بەدەم سپیی گێلاسی خوشکم و هەموو ڕۆژێک لەوێ کەوتووە.

سەردار: ئەها، من ڕێگەیەکت بۆ دابنێم...............

(( ئەڵقەی سی و چوار)) ______ Cut ______________

دیمەنی – ٧٠٢ – ش/د – باخی ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆ))

ئاکۆ: دەی مادام باوکی ناهێڵێ بێتەوە، تۆ پەکت کەوت.

گێلاس: ئەرەوەڵا دەسخەڕۆ بووم.. دەستێکم کەوتە ئەملاو دەستێکم ئەولا.. وتم شۆڕش گیان من ئیتر ناهێڵم ئاوا بێت بەمناوەیا، هیچ گوێی نەگرت، وتی خۆی بۆ ناگیرێ.

ئاکۆ: ئەی نینا؟ هیچی نەوت؟

گێلاس: سەرەتا پێی سەیر بوو.. دواتر وتی ببورە پورێ، هەڵبەت باوکم باشتر ئەیزانێ.. خواحافیزیی یەکجارەکیشی کرد.

ئاکۆ: ئەوە بۆ تۆ قورسە.. ئەگینا ڕاستە خۆیان باشتر ئەزانن، ئەی کەست لە خەیاڵا نییە بیخەیتە شوێنی؟

گێلاس: کەسی چی؟ مەگەر بە ناو خزمانا بگەڕێـ بزانم کێ بێ ئیشە!

ئاکۆ(( کەمێک مت بوون)): ئەی کچەکەی نارەوەن.. خۆ زانکۆی تەواو کردووەو هەر لە ماڵەوەیە، دیارە خۆیان نایانەوێ بیبەنە کۆمپانیاکانیان.

گێلاس: ئەوە خراپ نییە.. سبەی جومعەیە، تا نیوەڕۆکەی کە ئەچم دیار ئیزنبەم ناچمەوە بۆ ئوتێل.. هەر بەیانییەکەی قسەکەی لەگەڵ نارەوەن ئەکەم.. خوا بکا حەز بکا.

ئاکۆ: بۆ حەز ناکا، وەڵا دەستیشت ماچ ئەکا.

گێلاس: هەر بە نیوەی نیناش بزانێ بەسمە.

ئاکۆ: بابە نینا دانی مار بوو، کێ بەقەدەر ئەوی پێ ئەکرێ؟ ئەو لە کۆمپانیایتر ئیشی زۆر کردووە.

(( چوونی ئاکۆ بۆ ژوورەوە)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٧٠٣ – ش/ن – ماڵی پاشا:
(( پاشا تێل ئەکا، بە هەمان دەستوری جاران، ڕوخساری دیار نییە))
پاشا: ١- ئەو پارەیە زۆرە شاموراد، بۆ خۆی چەندە پارەکە، تا ئەو ئەوەندە ببا؟ .......... ٢- باشە وابکە پارەکەی پێ زیاد بکەن....... ٣- ئەی هەتیوەکە سمکۆ ئەڵێم دوای هاتنە دەرەوەی لە زیندان چی ئەکا؟ ........... ٤- باشە لێیگەڕێن با ئیشی خۆی بکا.. جارێ ئیشمان بەو نییە، با وابێ تا ئاگادارت ئەکەمەوە........ ٥- هیچ نییە، دیارە لە ماڵە خزمانییەتی..ئیتر وریاتر بن شاموراد، زوو زوو تەلەفونت بۆ ئەکەمەوە.
(( مۆبایل دائەخاتەوە))
Cut

دیمەنی – ٧٠٤ – ش/ن – ژوورێک:
(( شاموراد تێل ئەکا))
شاموراد: ١- ئاخر پاشا گیان تۆ حسابی ئەوە بکە، هەموو ئەرکەکە لەسەر ماڵەکەی و خۆی و خێزان و کچەکەیەتی........ ٢- فەرمانتە پاشا گیان، ئەوە ئەکەم ................ ٣- پاشا گیان خزمەکانی قفڵی دەرابەکەیان شکاندووین و عەرەبانەکەیان بۆ خستبووە ناو دوکانەکەوە.. ئاگاداربووین کردەوەو خەریکی پاککردنەوەی دوکان بوو، جلەکانیشی هەر تیایە ........... ٤- بەڵام پاشا گیان ئەمشەو خەڵکمان نارد، لە کەلاوەکەی نەبوو، گلۆپیشی کوژابۆوەو خزمانیشی دیار نەبوون........ ٥- فەرمانتە پاشا گیان.
خۆ سەگبابە دایخستەوە.. ئەچێتە ژوورێکیتر.
Cut

دیمەنی – ٧٠٥ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن خۆی گۆڕیوە بۆ دەرەوەو تیرۆژ حەوشە ئەشوات))

نارەوەن: ئاگات لە ماڵەکە بێ کچێ، نیوەڕۆ کاکت و ئاوا دێنەوە چێشتێکی باشیان بۆ لێنێی.. کاکت نانی دەستی ئەو ناخوا، نەکەی چێشت بەو لێ بنێی! بیرت نەچێ کە ئاڵتون تەواو بوو، سەرە مانگانەیەتی بیدەرێ.

تیرۆژ: دەبا خۆت لێتنایە، حەزیان بە خواردنی دەستی خۆتە.

نارەوەن: ئیشم هەیە مەجالم نییە، بۆ من درەنگە.

(( نارەوەن نزیکی دەرگاکەیەو لە دەرگا ئەدرێت، ئەیکاتەوە گێلاسەو پاش سڵاو))

گێلاس: نارەوەن خان بۆ خوازبێنیی تیرۆژ هاتووم هههەه.

نارەوەن(( پێکەنین)): ئەمە بۆ کێ ئیشەڵڵا؟

گێلاس: ئەمەوێ بێ لە ئوتێلەکەم ئیش بکا، ئەگەر تۆ ڕات لێ بێ و خۆشی ڕازیی بێ.

(( تیرۆژ بەرەو ڕووی ئەچێ و دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٧٠٦ – ڕ/ د – پارکێکی گشتی:

(( زوبێر بە تەنیا لەسەر کورسییەک دانیشتووە لە سێبەردا.. چلورەفرۆشێک بانگەوازی چلورە ئەکا ))

زوبێر: چلورە چلورە (( وەڵام و چلورەیەکی سپیی هەڵئەگرێت و پارەی ئەداتێ )) کەمێکیش تواوەتەوە ها؟! هەهە

مناڵ: بەخوا خاڵە بەدەست من نییە، هەرچی ئەکەم هەر ئەتوێتەوە.. توخوا دایمەنێرەوە.

زوبێر: نا باوکەکەم، بڕۆ.. من حەز ئەکەم کەمێ شل بێ، ئاوا خۆشترە. (( مناڵەکە سوپاس ئەکاو ئەڕوا )) هەهە ئای داماو.. خەمی ئەوەیەتی داینەنێمەوە.. هەهە.. ئەو چوزانێ ئەو پارە کەڵەکە بووەی لای منە چەندە؟ ئەو چوزانێ پارەی چلورەیەک هیچ ناکا بۆ من و هیچ مانایەکی نییە.. ئەو ئەوەنە ئەزانێ، توانەوەی چلورەیەک زەرەری لێئەدا.. ڕەنگە لە ماڵەوە لێدان بخوا لەسەری، ڕەنگە هەزارانی ئاواش ڕۆژانە لەسەر شتی ئاوا بچووک توشی ئازاری جەستەیی یان هیچ نەبێ دەروونیی ببنەوە.. بەمەش ئەوترێ دادپەروەریی.(( بەدەنگی بەرز پێکەنین ))

گەنجێک (( بەوێدا دێت و زۆر سەرنجی ئەدا.. تێئەپەڕێ و ئەگەڕێتەوە )): پێکەنینەکەتم پێ جوان بوو مامۆستا.. خۆزگە نوکتەیەک بووایەو بۆ منیشت بگێڕایەتەوە.

زوبێر: نا کوڕی خۆم، نوکتە نەبوو، گیرخواردنم بوو لە دۆزەخی خۆما، بەو پێکەنینە ئازاد بووم، ڕزگارم بوو.. کاتێ مناڵێکی برسیم بینی لە هەمان ڕەگەزی خۆم، دۆزەخێک لە ناخما بەرپابوو.. ئەوەش دۆزەخە ڕاستەقینەکەیە؟ لەبەرئەوەی تەنها هەستم بە برسێتییەکەی کرد، بە ئازارو ناڕەحەتیەکانی؟

گەنج: هەر بە هەست کردنت تۆ لەو دۆزەخە دەرباز بووی مامۆستا.

زوبێر: نا کوڕم خۆ من کازانتزاکی نیم ئەوە بە دادپەروەریی بزانم.. زۆربا لە ناچاریا وای وت، بە هەڵە تێنەگەی.. ئێمە بەو بچووکیەی خۆمانەوە لە گەردوونا ئەتوانین چ یاسایەکی سروشتیی بگۆڕین؟

گەنج: هەوڵت بدایە، بەلانی کەمەوە ئەو تێر بکەی، ئاسوودەتر نەئەبووی؟

زوبێر: نا.. دۆزەخەکە دانەئەمرکایەوە.. ئەزانی ئەو منالانەی وەک ئەون لە ژمارە نایەن ؟ مرۆڤایەتیی ئەو غەدرە گەورانەشی هەیەو بۆی چارەسەر ناکرێ.

گەنج: تا سەرمایە بناغەی هەڵکشانی مرۆڤ بێ؟ مەبەستت ئەوەیە؟

زوبێر: من پێشترم لێک ئەدایەوە، ئۆو زۆر پێشتر.. لێکدنەوەی پێش سەرمایەو پێش سەرهەڵدانی خێڵ و پێش دروست بوونی دەوڵەت و دامەزراندنی گروپەکانیش.. ئەها!.. ئەبینی چۆن ئێمە ئەتوانین مرۆڤ خۆی بکەینە کەرەستەی لێکدانەوەمان؟ بەوەش بیرکردنەوە لە داهێنانی سیستمێکی نوێ بۆ مرۆڤایەتی؟

گەنج: کە دەوڵەت و خێڵ و گروپ نەبێ، ئەی کێ گەورەی تۆیە کەواتە؟

زوبێر: خۆم.. ئا کوڕم، کەس گەورەی من نییە، هەر خۆم گەورەی خۆمم.. تۆش وابە.. ڕەواقییەکانیش وایان ئەوت (( هەڵئەسێ و بە تەمسیلی شانۆیی بە دەنگێکی گڕەوەئەڵێ)) ئێمە خۆمان گەورەی خۆمانین.. گەردوون بە لێکدانەوەو دنیا بینیی منەوە گەردوونە، کە من نەبم، بەلانی هیچ شتێک بوونی نامێنێ.. ئیتر بۆ ئەم بوونە پاکیزەییە ببەخشمە ئیرادەی کەسێکیتر؟

گەنج: مامۆستا تۆ شیرینی و من کاتم کەمە.. ئەگەڕێمەوە لات هەر ڕۆژێک لێرە بتبینمەوە.

زوبێر: وەک هەموو ئەوانیتر، منیش دەستبەتاڵ نیم گەنجی ئازیز.. بڕۆ بەخێرچی.

(( خوا حافیزیی و ڕۆشتنی گەنجەکە))

زوبێر: بچمەوە سەر ئیشێک باشترە، ئەم خەڵکەی ئەیبینم، زۆرم ئەوروژێنن، بەرگە ناگرم و بەم ئەخیری عومرەوە ههە ئەقڵەکەشم لەدەست ئەیەم.(( هەڵئەسێ ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ٧٠٧ – ڕ/ د – سەر شەقامێکی گشتیی:

(( نارەوەن بە سەیارە ئەڕوا.. لەوبەری جادەوە چاوی بە شەنیا ئەکەوێ وەستاوە، خاوی ئەکاتەوەو ئەوەستێ.. پاش کەمێک سەیارەیەک دێت و پاش کەمێک .. نیزام دائەبەزێ و باڵی شەنیا ئەگرێت و بەزۆر ئەیخاتە سەیارەکەیەوەو دەرئەچێت.. نارەوەن نازانێ باوکی شەنیایە))

نارەوەن بە خێرایی سلف لێئەدات و ئەیەوی بڕوا، ئەبینێ سەیارەکە لە یەکەمین یوتێرنی نزیک، بەرەو سایدی لای ئەم پێچ ئەکاتەوە.. ژمارەی سەیارەکە ئەگرێت و بە پەلە تەلەفون بۆ ئامۆ ئەکا))

ئامۆ: پیاوێک شەنیای فڕاند، خۆم بینیم، ژمارەی سەیارەکەم گرتووە.. تۆ تێلی بۆ بکە بزانە وەڵامت ئەداتەوە؟ خێرا چاوەڕوانی تێلی تۆ ئەکەمەوە کوڕم.

(( مۆبایل دائەخات و دەست ئەدا بە یەکا.. پاش کەمێک زەنگی بۆ دێت))

ئامۆ(( دەنگ)): هیچ نییە دایکە دەستخۆش، باوکی بوو بە زۆر سواری سەیارەکەی کردبوو..

نارەوەن: کوڕم قەت ڕێی تێ ناچێ باوک لەسەر جادەی گشتیی ئاوا کچی خۆی بخاتە سەیارەوە.

ئامۆ: نا دایکە خۆی وای وت، ئەڵێ جاروبار کە شتێکی بەدڵ نەبێ، تورە ئەبێ، وتی هیچ نەبوو.. وا ئەمبا بۆ نانخواردن.

نارەوەن: دەی باشە، یاخوا وابێ.. خوات لەگەڵ باوانم.. (( ئەڕوا))

ـــــــــ ربط ـــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٧٠٨ – مربوط - ڕ/د - ناو سەیارەی نیزام:

(( میر نیزام و شەنیا ))

نیزام: جا من چوزانم دایکیمان لێ قوت ئەبێتەوە؟

شەنیا: باوکە ئێمە لە شوێنی گشتیاین چاوەڕوانی هەموو شتێک بکە.. ئێستا نازانم چۆن ئەو درۆیەم چارەسەرکەم؟

نیزام: کامە درۆ؟

شەنیا: لای ئەو وتم باوکم سەیارەی نییەو فرۆشتوویەتی.

نیزام: ئەوەندەی من ئەتناسم تۆ پەکت لە درۆ ناکەوێ، بەڵام ئەوە ئاسانەو ئەویش لە خۆشباوەڕ ئەچێ، بڵێ سەیارەی ئیشی لابووە، هی برادەرێکیەتی.. ئەوە کەی کێشەیە؟

شەنیا: بەخوا باوکە ئەگەر بە قسەی تۆ ئەکەم هەهەهەهە پاک سەرم ئەتاشێ و ئەمنێرێتەوە.

نیزام: ئەی ئەڵێی چی؟

شەنیا: وەک خۆت وتت پەکم ناکەوێ خەمت نەبێ.. من وەک میرنیزامی باوکم داماو نیم هەهەهە.

نیزام: دەی ئینجا سەرەی منە، بە نیازی چی بوویت وا سەرنەئەکەوتی، قسە بکە.

شەنیا: ئەوکاتە بە نیاز بووم تەلەفونی بۆ بکەم بێت بە شوێنماو بچین بۆ نانخواردنێک، ئەبووایە ئەوەش بکەم.. بەڵام ماڵی تۆم ئاوا کرد، نەتهێشت.

نیزام: ئاخر منیش ئیشم پێت بوو.

شەنیا: بەڕاست سەرتان لێ شێواندووم، من پارەکەتان بۆ پەیاکەم؟ یان ئیشی ماڵەوەتان بۆ بکەم؟ دە با ئەمڕۆ لە دەرەوە نانەکەت بخواردایە، نەئەبوو؟ خۆ ئاسمان کەچ نەئەبوو.. دوای ئەوە لێمگەڕێن، ئەمەوێ بە ڕاست هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەو کوڕەیا بکەم.

نیزام: تۆ بۆ چی ئەچیت و چیت بەدەستەوەیە؟

شەنیا: باوکە زۆری خۆش ئەویم، کەسێکی باشەو بە کەڵکم دێت.

نیزام: ئیتر تۆش ئەوت چوو بە دڵاو حەزت لێکرد.

شەنیا: بەخوا باوکە ڕۆبۆت نیم.. کەسێکیتری وام لێ هەڵناکەوێتەوە، زۆر بێ عەیبەو بەڵێ خۆشم ئەوێ، بەڵام ئەو پارەیە ئەگەر وەک شیربابییش بێ، هەر لێی وەرئەگرم.. تۆ ئەگەیەنم بە مەرامی خۆت.. بەسە ئیتر ئێوەش واز لە من بێنن.

نیزام: ئەی ڕاماڵ چی لێ ئەکەی؟

شەنیا: تۆ بەڵێنت بە ڕاماڵ داوە من شووی پێ بکەم، من بەرەوڕوو بەخۆیم وتووە ڕقم لێتەو تۆم ناوێ.

نیزام: بۆ ئەوەی لەسەر هاوسەرگیرییت بەو هەتیوە ڕازی بم، ئەبێ بەشە پارەکەی من زیاد بکەی.

شەنیا: تۆ هەر خەیاڵت لای پارەیە، باشە، باش بەسەرچاو پێی زیاد ئەکەم.. بەس ئیتر تۆش بە هیچ جۆرێک دەست مەهێنە ڕێم.

نیزام: دەی ئەگەر وابێ، ئیتر من هەقم نییە بەسەرتەوەو کەی هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەکەی بیکە، بەڵام تۆزێک زوو، با ئەوەندە خەڵک نەتانبینێ بەیەکەوە.

Cut

دیمەنی – ٧٠٩ – ڕ/ ن – ماڵی حەمەتایەر – ژووری گشتیی:

(( باوکی تایەر لەسەر بەرماڵە.. دوای سەلامدانەوە، دوعا ئەکا ))

باوک: خوای گەورە بیکەی بە خاتری گەورەیی و عەزەمەتی خۆت و بۆ خاتری ئەو محەمەدەل مستەفایە، بۆ خاتری فەخری عالەم خوای گەورە حەمە تایەرم لەو زیندانە ئازادکەیت و بگەڕێتەوە ناومان.. خوای گەورە چاویان گوناهەکانی حەمەتایەرم نەبینێت و کوێراییان دابێت لە ئاستی حەمەتایەرداو نەیبینن و سزای نەدەن، خوای گەورە بە ڕەحمی بەرفراوانی خۆت، بەم ئەخیری پیرییەوە دڵشکاوم نەکەیت خوایە گیان، تۆبەو ئەستەغفار، پەشیمانم لە هەموو کردەوەیەکی خراپم.. خوایە گیان لە ئاست حەمە تایەرما لێڵاییان دابێت.. بسم الله الرحمن الرحيم، واجعلنا من بين ايديهم سدا، ومن خلفهم سدا، فأغشيناهم، فهم لا يبصرون (( فوو ئەکات بۆ دوورو دواتر)) خوایە گیان بە گەورەیی ئەم ئایەتە کوێر بن و حەمە تایەرم بپارێزی خوایە.. بسم الله الرحمن الرحيم.. الله لا اله الا هو الحي القيوم، لاتأخذه سنة ولا نوم، له ما في السموات وما في الارض، منذ الذي يشفع عنده الا بأذنه، يعلم مابين ايديهم وما خلفهم، ولا يحيطون بشيء من علمه الا بما شاء، وسع كرسيه السموات والارض، ولايؤده حفظهما وهو العلي العظيم.. صدق الله العظيم (( فوو ئەکات بەرەو لایەک و هەڵئەسێتە سەرپێ و بەرماڵ کۆئەکاتەوە)) خوای گەورە حەمەتایەرم بپارێزیت خوای گەورە.

Cut

دیمەنی – ٧١٠ – چێشتخانەیەکی فاخر:

(( حەمەخدر بە جلوبەرگی ئاساییەکەی و بە بۆینباخ و قاتەوە دانیشتوەو نارەوەن لە دەست شتن ئەگەڕێتەوە، لەبەرهەستانێکی کەم))

نارەوەن(( پێکەنین)): ئێ سمکۆی باوەفاخر، هەهە ئەم ناوەت لە کوێوە هێنا؟

خدر: دەستی خۆمی تیا نییە، هەموو شتێک خۆی ڕێکخراوە.. کەلاوەیەکیان بۆ دروستکردووم لە دەرەوەی شارو ماڵێکیان بۆ داناوم نۆکاو و پاقلەکەم بۆ ئەکوڵێنن و ئەشمپارێزن.. بیست سی گەنجی پۆلیسیش ڕۆژانە چاودێریم ئەکەن و من ئەوەم لەسەرە بڵێم خزم و کەسوکارن.... هههە لە هەمووی خۆشتر خۆزگە ئەتبینی لەوێ چەند سەرسەریم لەگە پاشاو پیاوەکانی، من بەس تەمسیل کردنی سمکۆم لەسەرەو هیچیتر.. ئاواش قسە ئەکەم کە بینیت.

نارەوەن: هاهاها ئەی پلانەکە جوان هاتووە؟ خۆزگە منیشی تیابوومایە!

خدر: هەر یەکدوو ڕۆژیترەو پاشاو داروبەردیان ئەکەونە داوەکەوە، پلانەکە نەقیب ڕاهۆزی خۆمان دایناوەو لەبەرئەوەی لە دەسەڵاتی پۆلیسدایە، بە تەواوەتی عەقید بەهێزی لێ تێگەیاندووەو خوا هەڵناگرێ، ئەویش زۆر زیرەکە، ئەگەر کەموکورتییەکیشی تیابێ، بەڕاوێژکردنی هەردوولایان چارەسەر کراوە.

نارەوەن: ئەی بیرت نەکردەوە منیشی تیابم؟ هیچ نەبووایە نۆک و پاقلەکەم بۆ لێ ئەنای. هههەه

خدر: نابێ پورێ گیان نابێ! ئەمە ئیشی پیاوە پیاو هههەه.

نارەوەن: ئاوا؟ بووین بە پورێش ها؟ هەهە

خدر: ئەی هەر پورێ نیت؟ گاڵتەت لەگەڵ ئەکەم، خۆی وتی با نارەوەن خان نەزانێ، دیراسەمان کردووە جێی ئەوی تیا نابێتەوە.. کە بۆشت باس ئەکەم، نابێ ئەوان بزانن.. ئەرێ بەڕاست نەتناسیمەوە؟ تا وتم بەختەبارانم بیت؟

نارەوەن: نەوەڵا بە چیا بتناسمەوە؟ تۆ هەردەمەو بە نەوعێک دەرئەکەوی هەی ڕێوی.

خدر: دەی ئەگەر وابێ، پاشاو دارودەستەکەشی باش تێکەوتوون.

نارەوەن: نەوەڵا باوەڕ ناکەم هیچ کەسێک بتناسێتەوە.. ئەی ڕەنگی چاوت بە چی گۆڕیبوو؟ عەدەسە بوو؟

خدر: کچێ ڕەنگە بڕوا نەکەی، یەک ستافی مکیاژ لەو ماڵەن، هەر شەبەقی دێن و دەست ئەکەن بە مکیاژ کردنم.. هەر مەپرسە چی ئەکەن.. جاری وا هەیە بۆ سوعبەت ئەڵێم کاکە وا بە خەستیش نا، با هیچ نەبێ خۆم خۆم بۆ بناسرێتەوە.

نارەوەن: حەمەخدر ئەمەوێ ئیشێکم بۆ بکەی!

خدر: بەسەر هەردوو چاوم، خوا ئەکا تۆ ئیشت ئەکەوێتە من، هەر خزمەتت ئەکەم نارە خان.

نارەوەن(( وەرەقەیەک لە جانتاکەی دەرئەهێنێ و ئەیخاتە سەر مێزەکە)): میرنیزام سەلیم طارق.. ئەندازیاری مەدەنییە، ئەوە ژمارەی خانووەکەی.. ئەویتریان خورشید کەیکاوس نیعمەت، ئەمەیان لە زیندانە، دۆسیەکەی چییەو هۆکاری گرتنەکەیم ئەوێ.

خدر: ئەی میرنیزام؟

نارەوەن: بزانە ئەو خانووەی تیایەتی بەناوی کێوە تۆمار کراوە؟ بە حساب ئەندازیارەو نوسینگەی ئەندازیاریی هەیەو فەرمانبەریشە.. هەوڵ بدە بزانی ئەو زانیارییانە ڕاستن یان نا؟

خدر: هەرچەند من نابێ لە عەرەبانەکە دوورکەومەوە بەهیچ جۆرێک، تا لەگەڵ پاشا دائەنیشم.. بەڵام لە ڕێی برادەرانی خۆمانەوە شتم دەست ئەکەوێ.. ئەی بۆ بە نەقیب ڕاهۆزت نەوت؟ خۆ بۆ ئەو ئیشی یەک دوو سەعاتێکە.

نارەوەن: لەبەرئەوەی بابەتێکی خێزانییە، ئیشی ئەو نییە.

خدر: وایە.. باشە بەسەرچاو بێخەمبە، بەڵام ڕەنگە بەهۆی ئەم وەزعە تازەیەوە چەند ڕۆژێک بخایەنێت.

نارەوەن: باشە، بەڵام تا زووتر بێ درەنگە ((گارسۆن دێت و مینۆی پێیە))

Cut

دیمەنی – ٧١١ – ش/د – حەوشەو باخیماڵی شۆڕش:

(( نیناو باوکی دانیشتوون))

نینا: ئەو کەیفی خۆیەتی باوەگیان.. لای منەوە هیچ خۆشەویستی دروست نەبووە، بەڵام کە ئەڵێم بیری ئەکەم، بیری شەڕە سوعبەتەکەی ئەکەم، هەر ئەویش بیری پورە گێلاس و شوێنەکە ئەکەم، زیاتر نییە.. لەوێ ڕاهاتبووم و ڕەنگە ئەگەر سبەی نەچمەوە کەمێ بێتاقەت ببم.. هیچ نییە تێی ئەپەڕێنم، خەمت نەبێ.

شۆڕش: زۆر بە زوویی هەوڵ ئەدەم شوێنێکیتر بدۆزمەوە پێویستیان پێت بێت، ناهێڵم زۆر لە ماڵەوە دانیشی کچم، لەخوا بەزیاد بێ دەست ڕەنگینی و پەکت ناکەوێ.

نینا: نا نا زۆر بە کۆڵیەوە مەگرە، هەموو شتێ ڕاهاتنە باوە.. ئەزانی من خۆشەویستیشم بەلاوە ڕاهاتن و ئالوودە بوونە، وەک جگەرەو مەی و تلیاک و ئەو جۆرە شتانە، خۆشەویستیش ئاوا پێیەوە ئالودە ئەبی.. کە یەکێ ئەڵێ دووکەس ٣٠ ساڵ عاشقی یەک بوون ئەوسا بەیەک گەیشتن، هیچ حیکمەتێکی تیا نابینم، وەک ئەوە وایە سی ساڵ جگەرە کێش بووبێت.. خۆی هەر ساڵی یەکەمی زەحمەتەو عەشقەکە سەختە، ئیتر ئەو باقیەکەی ئالوودەبوونە. خۆی ئەڕوا هههە.

شۆڕش: ڕاستە، ئەگەر ساڵێک بە یەک نەگەن و هەر یەکتریشیان خۆش بوێ و دەست لە یەکتر هەڵنەگرن، وایە ئەتوانن سی ساڵیش بەردەوام بن.. بەڵام تۆ مادام ئەوت خۆش ناوێ، هەر زۆر زوو بیرت ئەچێتەوە.. ئێستا زۆرتر دڵنیابوومەوە لە تۆ.

نینا: بەڵام ئەو بیری ناچێتەوە باوە گیان ئەوەش بزانە.. دڵنیابە بەردەوام هەوڵی خۆی ئەدا پێم بگا، ئەوەیان بە ئاسان وەرمەگرە.. ئەو هەر زۆری خۆش ئەوێم.

شۆڕش: تا من مابم، با هەر سەرهەڵکرێنێ.. هەهە .. بۆ پاش مردنیشم دڵنیام لە ڕای کچە ئاقڵەکەم.. بەخوا ئەو ماڵە زۆر سەربەگۆبەنن، تا دووربی ێیانەوە ڕەنگت سوورترە. (( پێکەنین و هەستانی باوک بۆ ژووریک))

Cut

دیمەنی – ٧١٢ – ش/ د – حەوشەو باخیماڵی گێلاس:

(( گێلاس میوە ئەهێنێت و ئاکۆ دانیشتووە))

ئاکۆ: ژنەکە ئەمڕۆ شتێکی سەیرم بینی.

گێلاس: خێر؟

ئاکۆ: ئەها ئەو کچەکەی لەگەڵ کوڕە گەورەکەی نارەوەنا بوو؟!

گێلاس: ئامۆیان!

ئاکۆ: ئا ئا.. لەگەڵ کوڕێکی گەنجا هاتن و زۆر تێکەڵ دیار بوون، سەرەتا وتم ڕەنگبێ برای بێ، ئاسایی وەرمگرت.. نا دوایی دیقەتمدا لە خوشک و براو شتی وا نەئەچوون.. چوونە دوکانی دۆلارەکەی بەرامبەرمان، ئەو واحیدەکەی بۆم باسکردی؟!

گێلاس: ئێ ئێ ئەزانم.

ئاکۆ: زۆریان پێچوو، منیش خۆم لێ ئاشکرا نەکردن تا ڕۆشتن.. دوایی چوومە لای واحیدو لێم پرسی چییان ئەویست؟.. وەلحاسڵ وتی نزیکەی ٣٠ هەزار دۆلار. دیناریان پێ بوو، کردیان بە دۆلار بۆ کچەکە، بەس دیار بوو خۆشەویستی یەک بوون..

گێلاس: وی بیسمیلا، خۆ ئەوان وتیان هاوسەرگیریی ئەکەین؟!

ئاکۆ: ئا ئا ئیتر لێم پرسی ناویان چی بوو نەک من بە هەڵەیا چووبم؟ وتی بەخوا هەر ئەوەنە ئەزانم زوو زوو کوڕەکە بانگی کچەی ئەکردو پێی ئەوت شەنیا.. ئیتر نازانم ناوی خۆی بوو یان نا؟

گێلاس: وا بزانم وابوو، یان(( بە تێفکرینەوە)) شیلان بوو؟!!!! شەهلا بوو؟!!! ئاوا " ش" ێکی تیابوو ناوەکەی.. جا تۆ بڵێی ئەو بووبێ؟

ئاکۆ: ئەیچۆن؟.. ناوەکەش هەر شتێکی وابوو، بەڵام کچەکە بە دڵنیایی ئەو بوو، ئەشێ ناوەکەی گۆڕیبێ، منیش زۆر دڵنیا نیم.. ئیتر ئەم هەموو پارەیەی لەکوێ بوو؟ بۆ

لەگەڵ کوڕێکی غەیرەیا هاتووەو وا دەرکەوتووە خۆشەویستی یەک بن؟ ئەگەر هی کوڕەیە بۆ هەر خۆی بۆی نەکردووە بە دۆلار؟ ئەوانە هەموو بوون بە پرسیار لای من.

گێلاس: وەڵا ئەوە سەیرە.. تۆ با ڕۆژێ ببینم هەمووی لێدەرئەهێنم.

ئاکۆ: جا هەقمان چییە بەسەر ئەو سەرێشەیەوە؟ هەر بۆ ئەوە بۆمگێڕایتەوە، شتەکەم زۆر بەلاوە سەیر بوو.

گێلاس: هەموو شتێ ڕێی تێ ئەچێ.. خوا ڕەحم بە ئامۆ بکا.

ئاکۆ: یاخوا.

(( میوە خواردن))

Cut

دیمەنی – ٧١٣ – ش/ن – ماڵی ئەردەڵان:

(( ئەردەڵان ڕاکشاوەو دەستی خستۆتە ژێر سەری))

ئەردەڵان مۆنۆلۆژی ناوەوە:

ئای خوایە گیان بە گلەیی نەبێ هیچت بەشنەدام، هەر تۆزێ ئەقڵەکەی بدامایەتێ وەک ئەو خدرە چەکلە بۆ خۆم بژیامایە باش بوو.. هەتیو تۆ سەیریکە چۆن دەستی پێکردو لە پڕا بوو بە باشحەماڵ و ئیشی بازاڕەکەی هەموو ماشییەوە بۆ خۆی.. ئینجا بوو بە شەریک لە کۆمپانیاو کچ و ژنی دنیای کەوتە بەردەست، ئەم بەڕوویا پێئەکەنێ و ئەو خۆی تێ هەڵئەسوێ و کورە بەخوا دیارە ماچ و شتیشی ئەدەنێ.. ئینجا ئەوە ئەم ماوەیە دیار نییە، هەر خوا مەگەر بۆ خۆی بزانێ چی بەدەستەوەیە؟ جا ئەیبینینەوە کە گەڕایەوە کۆمپانیایەکی لەوی نارەوەن و ئەوانەش گەورەتر دائەنێ و ئەوە ئیتر بۆ خۆی ئەتەقێ و بۆ کوڕاو کوڕی بەسیەتی.. ئیتر ژنی بۆ چییە؟ ئەوسا دەست بخاتە سەر هەر یەکێک هی خۆیەتی، ئەرەوەڵڵڵا.. دەی ئەردەڵان تۆش شتێ بکە ئەم هەژارییە جێهێڵی، دەی ئافەرین، هەوڵبە، خۆت لە خەڵک نزیککەرەوە، تا کەی وا ئەبی؟

مۆنپلۆژی ناوەوە تەواو:

Cut

دیمەنی – ٧١٤ – ڕ/ د – عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ نۆکاوەکەی ئەفرۆشێت و بانگەوازی بۆ ئەکا بە شێوازی خۆی، کەسوکارەکەی بڵاوبوونەتەوەو چەکیان پێوە دیار نییە، بە جۆرێک هەستیان پێ ناکرێ.. سەیارەیەکی بەرزی ڕەش دێت و دوو چەکدار دائەبەزن و هەوڵ ئەدەن خدر٣ ببەن))

خەلیل(( بە دەمامکەوە، چەکداری پاشا، چەکی پێیە)): سمکۆ، بێ دەنگە دەنگ سەرکەوە لەگەڵمانا.

خدر٣: بۆ کوێ هەی نابەڵەد؟

(( دوو چەکدار لە دوکانەکەوە کلاشینکۆف یان هەر چەکێکی ئۆتۆماتیکی ئەخاتە سەرسەریان و چەند چەکدارێکیش بە دەمانچەوە دێنە پێشەوەو داوای چەک فڕێدانیان لێ ئەکەن و چەکیان ئەکەن))

خدر٣: ها قارەمانەکانی پاشا، نەموت نابەڵەدن؟ (( دەمامک لەسەریان ئەکاتەوە، دوای ئەوەی ئەوان چەکەکانیان لێ سەندوون.. یەکێکیان خەلیلی لای پاشایەو ئەوی تریشیان ئاسۆ)) ناوتان چییە؟ (( خەلیل و ئاسۆ وەڵام ئەدەنەوە)) هەی طڕحێو پیاوەکانی پاشا، خۆ هەر بە کڵاو گیران؟! هههە.

چەکدارێک: ئامۆزا بیانکوژین؟

(( پاڕانەوەی خەلیل و ئاسۆ))

خدر٣: دەک عەمرتان نەمێنێ.. جا کە ئەوەندە لە مردن ئەترسن، بۆ دوای ئەو ناپیاوە کەوتوون؟

چەکدارێکیتر: ئامۆزا گیان، مادام ئەوەندە ئەترسن، با مەحفیانکەینەوە.

خدر٣: نا، وازیان لێ بێنن، با ئاوا بە لوتی تەزیو و سەری شۆڕەوە بگەڕێنەوە بۆ لای پاشا خوێڕیەکەیان، با بۆی بگێڕنەوە سمکۆ کێیەو چی پێ ئەکرێ.. (( بۆ خەلیل و ئاسۆ)) خوێڕیانە بەو سەگبابەش بڵێن سمکۆ پارووی ئاسانی تۆ نییە وەک شامورادە

گێژەکە..(( بۆ خزمەکانی)) ئەو چەکانەشیان بۆ خۆتان بفرۆشنەوەو پارەکەی دابەشکەن بەسەر خۆتانا.

چەکدار: زۆر سوپاس ئامۆزا گیان، مەمنونین.

خەلیل: لێت ئەپاڕێمەوە ئێمە مەرەخەسکە با بڕۆین، تۆبە، دەستت ماچ ئەکەم کاکە سمکۆ گیان.

خدر۳: ئای خوایە کە ئێوەش هیچن.. (( تورە)) بڕۆن دەی، ملتان بشکێنن. (( ئەیانەوێ بچنەوە ناو سەیارەکە)) ئا بەو خوێڕییەش بلێن، ئەگەر ئەم بەزمەی ئێوەی بە دڵ نییە، با خۆی بێت (( پێکەنین بە دەنگی بەرزو گاڵتەجاڕیی چەکدارەکان بەو دووە تا تێ ئەپەڕن))

Cut

دیمەنی – ٧١٥ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( شەنیاو ئامۆ دانیشتوون))

شەنیا(( گرژ)): نا باسی هاوسەرگیریشی لامەکە!

ئامۆ: شەنیا ناکرێ من لێت تێ نەگەم، چاوەکەم پێویستیم بە ڕوونکردنەوە هەیە.

شەنیا: لە ئێستایا ناتوانم هیچ ڕوونکردنەوەیەک بدەم.. تەنها ئەوە بکە کە پێت ئەڵێم.. ئەو ٤٠ هەزار دۆلارەی بە ناوی خۆتەوە بدەرێ، بە هیچ جۆرێک ناڵێی شەنیا بۆی هێناوم.. باسی هاوسەرگیریی ناکەیتەوە بە هیچ جۆرێک، ئەگەر ئەویش ویستی سەری باس دامەزرێنێ خۆتی لێ بدزەرەوە ئامۆ گیان.. تۆ ئەوانە بکە، هەموو شتێک باش ئەڕوا.

ئامۆ: دایکم ئەمشەو بەهیچ شێوەیەک ئەو دیمەنەی بیر نەئەچووەوە کە باوکت بە توندوتیژیی خستبووتیە سەیارەکەیەوە.. دواتریش بە پێکەنینەوە بە من ئەڵێی دەعوەتی نانخواردنم ئەکا.. هەموو ئەوەمان پێ سەیر بوو.. ڕوونکردنەوەم لەسەر ئەوەش نادەیتێ؟

شەنیا: نا ڕوونکردنەوەی ناوێ، باوکم هەر خۆی سروشتی وایە، لەپڕا هەڵئەچێ و زوو دائەمرکێتەوەو نەرم ئەبێ.. بڕیار بوو بچمە بازاڕو ماسیان بۆ بێنمەوەو لە حەوشەکە بیبرژێنن، ئێ کاتەکەی خراپ بوو، ئەو دوکانەی من بۆی چووم داخرابوو جومعە بوو.. بۆیە زیاتر توڕە بوو چونکە ماڵی مامی لێ بوو، ئێ چی بکەم خۆ بە تەکسی هەموو شار ناگەڕێم.. ئیتر ئەویش بەو دەمارگیرییەی خۆیەوە بە سەیارەکەی مامم هات، شوێنەکەی ئەزانیم، دواتریش هەمووومانی بردە ڕێستورانت دەعوەتی کردین. چیتر ئامۆ؟ ئەمڕۆ لێکۆڵینەوە زۆر ئەکەی.

ئامۆ: من و تۆ ئەبینە هاوسەری یەک شەنیا، ئەبێ زۆر ڕوون و تیوار بین لەگەڵ یەکتر.. ئەبێ هەموو شتێکم لا ڕوون بێ و تۆش هەروەها.

شەنیا(( هەڵئەسێ)): ئەوەی ئەتوانم بیڵێم پێموتی.. ئەمرێکیترت نییە؟

ئامۆ: ئەو ڕەقیەم لە سروشتی تۆیا بە دڵ نییە، پێویستە لەگەڵ منا نەرمتر بی.

شەنیا: بمنێرە بۆ چارەسەری سروشتیی. بای! (( ئەیەوێ بڕوا ))

ئامۆ(( توڕە )): شەنیا بگەڕێوەو دانیشە.

شەنیا(( ئەگەڕێتەوەو دائەنیشێ، گرژ)): بەڵێ ئەمرکە.

ئامۆ: مەڵێ جارێ هاوسەرگیریی بە زوو ئەزانم.. ئەم گرژیی و ڕەقیەتم بە دڵ نییە، ئەگەر حاڵەتەو لە بارێکی دەروونیی خراپدای؟ ئەوە جیاوازە.. ئەگەر سروشتی خۆشتە، من ناتوانم لەگەڵ ئەو سروشتەیا بگونجێم.. با لە ئێستاوە ڕاستت پێ بڵێم.

شەنیا: سروشتی من وانییە.. ئەگەر پەشیمانی لە بڕیارەکانت ئەتوانی بکشێیتەوە.. ئەوە دوایی ئەبێ بە بەڵا بۆ هەردووکمان.

ئامۆ: پەشیمان نیم، من سەریشی لەسەر دائەنێم، بەڵام بەم گرژییەش ڕانەهاتووم.

شەنیا: گرفتەکە ئەوەیە من ناتوانم هۆی نیگەرانییەکانمت پێ بڵێم کە تۆ سەرچاوەکەی نیت.. لێمگەڕێ ئامۆ گیان، با خۆم هێور ببمەوە.

ئامۆ: مادام سروشتی خۆت نییە، ئەوەم زۆر پێخۆشە.. بڕۆ تا هێور ئەبیتەوە مەیەرەوە ئاساییە.. هەر شتێکیش بە من ئەکرێ، ئامادەم.

شەنیا: ئەمڕۆ باوکم ئەتبینێ و بە ناوی خۆتەوە پارەکەی ئەدەیتێ باشە؟

ئامۆ: بەڵێ باشە.

(( شەنیا ئەڕوات و خواحافیزیی ))

Cut

دیمەنی – ٧١٦ – ڕ/ د – نزیکی ماڵی شۆڕش:

(( شۆڕش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.. ئاوا بە سەیارەکەیەوە ئەگاتە بەردەمی و دائەبەزێ.. سڵاوی گەرم و دەربڕینی خۆشەویستی لەلایەن ئاواوە ))

ئاوا (( بە لوتفەوە )): مامە گیان ببورە ڕەنگە کاتیشی نەبێ، ئەمەوێ بپرسم شتێک ڕوویداوە نەتهێشت نینا بێتەوە بۆ ئیشەکەی؟

شۆڕش: من مامت نیم باوکەکەم، جارێکیتر وا بانگم مەکە پێم ناخۆشە، لەبەرئەوەی ئەگەر بە نیازی نینای، با بیخەمە مستتەوە.. مەگەر بەسەر لاشەی منا بڕۆی ئەو خەوەت بێتە دی.

ئاوا: باشە، ئیتر ئەڵێم کاک شۆڕش.. کاک شۆڕش من ناپیاوانە نەهاتوومەتە پێشەوە، بە ئسوڵ و نەریتی خۆمان داوای دەستی کچەکەتم کردووە.. خوانەخواست هیچ بێ ئەدەبییەکت لە من بینیووە؟

شۆڕش: کچەکەم دادوبێدادی بوو بەدەستتەوەو ئەیوت لە کۆڵم نابێتەوە، هەربۆیە لە ئیشەکەش هەڵات.. کە ئەو پێت ڕازیی نەبێ خۆ بەزۆر ناچاری ناکەم شووت پێ بکا، بۆ سەردەمی بەردە ئاوا؟

ئاوا: ئەوەندەی هەستم بە کچەکە کردبێ لاری نەبوو.

شۆڕش: هیچ بەڵێنێکی پێداوی؟

ئاوا: نا گفتی نەداوە، بەڵام زۆر دوور نەبووین لەیەکەوە.

شۆڕش: ڕۆڵە ناکرێ هەر کەس مەرحەبای کردی ئیتر وابزانی حەزی لێکردووی.. باشتر وایە کەسێکیتر هەڵبژێریت و تۆش لەخوا بەزیاد بێ ساغ و بێ عەیبیت و دەست بخەیتە سەر هەر کچێ ڕەتت ناکاتەوە.

ئاوا: ئەی ئەوە نییە تۆ بە ناوی ئەوەوە ڕەتم ئەکەیتەوە؟ ئەتوانم خۆی ببینم تا بزانم ئەو ڕای چۆنە؟

شۆڕش: ئەو دەستە بخەرە ژێر سەرت کە جارێکیتر تا هەتایە نایبینیتەوە.. ئاوا بەرۆکیشمان بەردەو شتێکی تیا بهێڵەرەوە بۆ مەرحەبایی و مەیگەیەنە ناخۆشی.

ئاوا: جا ئەکرێ هەرکەس داوای کەسێکی کرد هەڕەشەی لێ بکرێ؟

شۆڕش: هەڕەشەت لێ ناکەم باوکەکەم.. ئێمە نەدیو و نەناسی یەکین و ئەم ماوەیە بەهۆی گێلاسەوە نزیک کەوتینەوە، هەی نەعلەت لە پێستی سەری گێلاسیش باشە؟.. ئەوە چووم و پارە قەرزە کۆنەکەشم لای ئەو بۆ داناویتەوە.. جارێکیتر نەخڵەتابی بەبەردەرگاشما بڕۆی، تێگەیشتی؟ (( ئەڕواتەوە بەرەو ماڵ و دەرگا بە توندیی ئەدا بە یەکدا ))

ئاوا: ئەک نەفرەتت لێ بێ شۆڕش.. یەڵڵادەی، نەبوو نەبوو، ئەچمەوە سەر دەستبڕینەکانی خۆم، دیارە من و ژنهێنانیان نەوتووە.. چاوی نیناش دەرئەهات.

(( سواری سەیارە ئەبێت و بە پەتەڕناش دەرئەچێت ))

Cut

دیمەنی – ٧١٧ – ڕ / ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( تیرۆژ کاری کۆمپیوتەر ئەکات لەگەڵ گێلاس دانیشتوون))

گێلاس: هەی ئافەرین تیرۆژ گیان، زۆر زوو ئیشەکە فێر بووی، چاوەڕێی ئەوە بووم بە مانگێکیتریش فێر نەبی.

تیرۆژ: لەو نەوەیەی ئێستا مەترسە گێلاس خان، هەموو پەروەردەی ئایپادو کۆمپیوتەرو مۆبایلن، زۆر خێرا شت فێر ئەبن.

گێلاس: قسەکەت تەواوە، خوا کارت ڕاس بێنێ، گرێکەت کردمەوە، بەڕاستی لە دووێنێوە خەممە، یاخوا تەمەن درێژ بی. دەستخۆش.

تیرۆژ: ئای ئای گێلاس خان، ئەو هەموو پێزانینە چییە؟ ئەوە ئەرکی خۆمەو بەو هیوایەی ببینی لە داهاتوودا ئەتوانم چیت بۆ بکەم.. منیش بیرۆکەی ئیشم زۆر لایە.

گێلاس: تیرۆژ گیان ئەو دزییەی لێیان کردم، جارێ هەناسەی تەنگ کردووم.. خۆماڵی ئاوا بێ کاکە ئاوا، ئەگەر ئەو نەبووایە هەر سەریشم لێ ئەشێوا.

تیرۆژ: ئەی ئێمەت بۆچییە گێلاس خان بۆ کاتی ئاوا نەبێ؟ هەموو لە خزمەتتاین.

(( هەندێ دیالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٧١٨ – ڕ/ د – عەرەبانەی خدر٣:
))خدر٣ زەنگی بۆ دێت، بە دەنگێکی سەرسەریانە وەڵام ئەداتەوە))
خدر٣: ١- باڵێێێێ ....... ٢- نا بۆ لێت عاخزم پورزا گیان؟ خۆ لچ و لێوی من نەبڕاوەو بڕۆی من نییە تاشرابێ، هههه ئەوە تۆی ئەتککراوی!!!! ........ ٣- ئەرێوەڵا گەر بیەوێ غافڵگیریکا، ئەمجارە لوتیشی ئەبڕێ، خۆ حاڵیی بووی.. بەخوا قەسەم یەک کەسیتر بکەیتە سەرم، ئەمجارە لووت و گوێشیان ئەکەم و ئەیخەمە مستیانەوە................ ٤- تێ ئەگەم ئەوەندە بێ ئاگا نییم، ئەزانم ئەڵێی چی؟ بەڵام ڕێک کەوتن بە فڕاندن ناکرێ.. با بزانی، هەرکاتێ بێم، شەش حەوت پیاوی یەکی یەکیی لەگەڵ خۆما ئەهێنم، بە تەنیا نایەم خۆم گورگان خواردووکەم بەقوربان.. من هیچ باوەڕێکی تەبایی و برایەتیم بە تۆ نییە، دێم و ئیشی خۆم ئەکەم و ئەگەڕێمەوە.. بەس لە عانی ئیشا یەکتر ئەناسین، دوای ئەوە نەناسەین لە یەکتر.. ئێوە زۆر قنگ بەگۆبەنن، کەڵکی تێکەڵیتان نییە........ ٥- من پیاوێکی دڵ و سینە سافم پورزا، ئەوەی لە دڵمایە لەسەر زمانمە.. تۆش ئەتوانی شەش حەوت پیاوی خۆت بێنی و منیش ئەیهێنم و برایەوە............ ٦- ئەگەر نییەتت پاک بێ، پەنجاش بێنم تۆ گوێی نادەیتێ، ئەگەر نیەتیشت خراپ بێ، دووبارە پەنجاش بێنم هەر کەمە.. کەوابێ قسەیەکم کرد ڕەتکردنەوەی نییە، حەوت یەعنی حەوت............ ٧- ئەرەوەڵڵا ............ ٨- جا ئەمە کەی پورزا؟ ..................... ٩- باشە دەی، چاوەڕێم، مشتەریی بۆ نۆکاو هاتوون، وەختی قسەم نەما.
(( مۆبایلەکەی دائەخاتەوە))

Cut

دیمەنی – ٧١٩ – ڕ/ ن – ژووری پاشا:
(( پاشا بە نەرمیی تێل ئەکا))
پاشا: ١- ئەوە چییە کاکە سمکۆ؟ ئەڵێی لێمان عاجزی؟............ ٢- جا پورزا دڵی یەت پورزای خۆی ئەتککا کاکە سمکۆ؟............... ٣- ئۆو ببورە ببورە کاکە سمکۆ گیان، دیارە من بە بێ مەبەست پورزاکەی خۆمم نیگەران کردووە، زۆر ببورە ئازیزم، من ویستم لەگەڵیانا بێیت و ڕێککەوتنەکەمان بکەین بۆ دەستپێکردنی ئیشەکە، بشهاتیایە ڕووبەڕوو ڕێک ئەکەوتین و بە پێی داواو ویستی خۆت.. دزیی و پیاو کوشتنیشی تیا نییە، شتێکە لەو سەر سنورانەوە ئەیگەیەنیتە دەستی من و بە تورەکە پارە وەرئەگری........... ٤- قسەکەت دروستە، ئێمە لە میانەی ئیشەوە ئەو باوەڕەت بۆ ئەسەلمێنین.. ئەی کاکە سمکۆ ئێمە چۆن باوەڕمان بە تۆ هەبێ شەش حەوت پیاوی ئازا لەگەڵ خۆت بێنی؟ ....... ٥- شەش حەوت زۆرە کاکە سمکۆ، هەر دووان بێنەو بەسە.......... ٦- کەواتە لە هەموو حاڵەتێکا تۆ پەنجاش بێنی هەر کەمە؟ ........... ٧- دەی کەواتە با قسەی تۆ بێ، حەز ئەکەی پەنجا بێنە، مادام ئێمە نییەتمان پاکە، گوێی نادەینێ ............ ٨- لەم هەفتەیەدا تەلەفونت بۆ ئەکەمەوە............ ٩- باشە پورزا خواحافیزت بێ.
ئای خوایە کە ئەم هەتیوە کەرە.. بەس میر ڕاست ئەکا، ئیشمان بە کەری وا مەیسەر ئەبێ.. جا خوا ئەزانێ ئەویش کەی داوای وەڵامەکەی ئەکاتەوە؟!

Cut

دیمەنی – ٧٢٠ – ڕ / د – ناو سەیارەی شاموراد:

(( شامورادو نیزام))

شاموراد: پاشا بە ڕوونیی پێی وتم نیزام گیان، ماوەیەک بەر لەئێستا خدر ناوێک پارەی لێ ئەکێشانەوە، پاشا خۆی خەڵکی ناردبوو تەقەیان لێ بکەن، تا ئەو خدرەیان لێ دوورخەنەوەو لەبری ئەو هەڵشۆی زاوایان بخاتە ناویانەوەو پارەکانیان بۆ پاشا بماشێتەوە.. کاکە پارەیان پارە نییە، وەک پاشا ئەڵێ چەندین ملیۆن دۆلاریان هەیە.

نیزام: کاکە شەنیای کچم ناتوانێ لەوە زیاتر پێ داگرێ، ئاخر وەک بیستوومە کەس ناتوانێ فێڵیان لێ بکا، ئەوسا کچەکەش ئەدەن بە دادگاو تیا ئەچێ.

شاموراد: وانین نیزام گیان.. ئەی خدر بە سەرکزیی خۆی لێیان چووە پێشەوەو هەر زۆر زۆری لێ ماشینەوە.. ئێستا دەریان کردووەو کەس نازانێ لەکوێیە، کاکە ئەوەندەی بردووە ڕەنگە بۆ کوڕاو کوڕی بەسی بێ، ڕەنگە هەر ئەم وڵاتەشی بەجێ هێشتبێ.

نیزام: بەخوا شاموراد گیان ئەوەی بە هەندێ کەس ئەکرێ بە ئێمە ناکرێ، کاکە ئەوانە لە سەد ئاویان داوەو قولە پێیان تەڕ نەبووە.. باشە پارەکانیان لە کوێیە؟ وەک ئەوەی هەڵشۆی لێئەکەین کە ناردینیە سەر ماڵەکەی خۆی و ژنەکەیمان تۆقاند.

شاموراد: ئەزانم پارووی چەورت لەوە خوارد حەز ئەکەی دووبارەیکەیتەوە.. کاکە کەس نازانێ ئەو ماڵە پارە لە کوێیا هەڵئەگرن.. خۆ پاشا خۆمی ڕاسپارد بۆ دزینی ماڵەکەیان، چووین و کوڕێکیشمان لەوێ بەکوشتداو هیچیشمان دەست نەکەوت، هەر یەک عانە چییە لەو ماڵەیا نەبوو.

نیزام: یەعنی هەر بە کچەکەی من ئەکرێ؟

شاموراد: پاشا ئەڵێ هیچ چارەسەرێکیترمان نییە، خۆ کچێکیتریشی بۆ کوڕەکەیتریان ڕاسپاردبوو.. ئەو ساختەچییە بە بەڵێنی درۆ و زل زل لە خشتەی بردبوو و دواییش دەستێکی تەڕی بە قنگیا هێنابوو و هەستابووە سەرپێ هههە.. ئەوەیان هیچی لەگەڵ ناکرێ.. بەس ئەمەیان زۆر داماوە.

نیزام: یەعنی داوای چەندی لێبکەم، شەنیا وتی هەر چل هەزار دۆلاری بۆ داناوم، کە بینیت، ئەتداتێ.

شامۆراد: ئەمە با وەک وەجبەی یەکەم بێ، دوای ئەمە داوای هەموو ئەویتر بکە.. کاکە ئەوە نەکەین بەخوا پاشا گەجەرو گوجەرەکانی ئەکاتە سەرمان و بە نوێژی نیوەڕۆ دامان ئەدورن.

نیزام: ئای خوا هاوارە!

شامۆراد: برا چاوی بڕیوەتە پارەی ئەوماڵەو بیللاهی تا چۆڕەبڕی نەکا، دەستیان لێ هەڵناگرێ.. ئەوە ئەیوت لەگەڵ کابرایەکیشا لە ڕێککەوتناین هێزێکی زۆری هەیە، بەو کابرایە کچە بچوکەکەیان ئەفرێنم و داوای چەند ملیۆنە دۆلارێکیان لێ ئەکەم.

نیزام: چاک گەڕی تێئالاندوون.

شامۆراد: هەر مەپرسە.. تۆ بڕۆ ئەو پارەیە بێنە نیزام گیان، با پاشا بزانێ ئیشمان پێ ئەکرێ، ئەوسا وەک دزییەکەی ماڵی هەڵشۆ بێ بەشت ناکا، خەمت نەبێ.. لەو شوێنەی پێموتی چاوەڕێت ئەکەم.

نیزام(( بە ناچاریی)): باش ش ش ش!

(( دابەزینی نیزام و ڕۆشتنی شامۆراد))

Cut

دیمەنی – ٧٢١ – ڕ – عەسر – د – باخیماڵی نارەوەن:

(( دوو شەربەت دانراوەو زوبێرو نارەوەن دانیشتوون))

زوبێر: بڵێم چی خوشکەکەم؟ ئیتر وا جارێ هەر ئەڕوانم و سەرنج ئەدەم.. هەست ئەکەم بازرگانییەکەی پێشووم پێ ناکرێتەوە.. بزانم چۆن ئەبێ.. بەدوای شتێکیترا ئەگەڕێم خەڵک لێی کۆببێتەوە، ئەویش کاتی ئەوێ.. ئێھ پێم بڵێ، خێر بوو پێتوتم بێم؟

نارەوەن: ڕاستییەکەی چەند شەوێکە لەگەڵ کوڕەکان بیر لە تۆ ئەکەینەوە.

زوبێر: سوپاستان ئەکەم، ئێوەش هەموو شەوێک باسی گەرم و گوڕی ئێمەن.. ئیتر لەمەودواش مەگەر هەر خۆم بیرتان بکەم.

نارەوەن: بۆ خێر؟ بۆ هەر خۆت؟

زوبێر: ئەوی ڕاستی بێت بیرم کردەوە تەنیا بژیم باشترە.. پیر بووین و ڕەنگە بووک و زاواش وەک مناڵ نەبن گوێ نەدەنە پڕخەو قرخە.. ئیتر لە دەوروبەری ماڵی ڕێژوان ئاوا خانوویەکی هاکەزاییم کڕیوەو بە ئیسراحەتی خۆم پێی لێڕائەکێشم.

نارەوەن: دەی چۆن وا ئەبێ؟ ئەی نان و چایەکە، جل شتنێکە پاککردنەوەیەکە؟!

زوبێر: کێشە نییە مناڵەکان لەو دەوروبەرەن، خۆ سوور ئەزانم، تا درەنگانی شەو دەورو خولم بەرنادەن.. تۆ باسەکەی خۆتم بۆ بکە، ئێ وتت بیرمان لێکردوویتەوە، بەو هیوایەی بیرکردنەوەی خێر بێ.

نارەوەن: هەر خێر ئەبێ ئیشەڵڵا.. ڕاستییەکەی کە ئێمە خانووەکەو کۆمپانیاکەو کۆمپانیای خۆراکەکەمان هەڵگرتەوە، ئەو کاتە زۆر ڕق ئەستوور بووین.. بەڕاستی چاومان بەرپێی خۆمانی نەئەبینی.

زوبێر: ئێ، ئەوە هەڵەیەک بوو ڕوویداو باسمان کردووە.

نارەوەن: بەڵام ئێستا بەو خوایەی بە هەقی ئەناسین و خالقی هەموومانە، برایەکم هەبووایە هەر هێندەی جەنابت ئازیز ئەبوو لە دڵما.

زوبێر: خوا مناڵەکان سەلامەتکا نارەوەن خان، تازە براو خوشک بە من و تۆ چی؟ ئێ فەرموو فەرموو قسەکەت تەواوکە.

نارەوەن: ئەوسا ئەو شتانەمان بە داشکانێکی زۆرەوە لە کوڕەکە هەڵگرتەوەو ئەویش گوێی نەئەدایە هیچ نرخێک، هەرچەندمان دانا، نەیوت نەء.

زوبێر: خۆم پێموتبوو، قسە لە قسەتانا نەکەن.

نارەوەن: ئیتر ئێمەش لە ڕق ئەستوریاو بە تایبەتیش من، زۆر پێمان لێداگرت.

زوبێر: تازە ئەوەچوو.. تۆ باسی ئێستا بکە، ئەمەیان گرنگە.

نارەوەن: کاکە زوبێر، ئێستا کوڕەکان هەموویان لێکدایەوە بە نرخی ئەو ڕۆژەو جیاوازییەکەیان دەرهێناو هەموو بڕیارماندا ئەو جیاوازییەت بۆ بگێڕینەوە.

زوبێر(( حەپەساو)): ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ بە گۆڕی...........

نارەوەن(( قسەی پێ ئەبڕێ)): سوێندو سوێندکاریی ناوێ، یەک ملیۆن سوێند بخۆی داد نادا ئەزانی بۆ؟

زوبێر: ئەم قسەیە مانای چییە؟ مەحاڵە ئەو پارەیە بگەڕێتەوە لای من با بزانی.

نارەوەن: ئاخر نەتپرسی بۆ داد نایا؟! لەبەرئەوەی ئەو کاتەی تۆ گەیشتیتە ئێرە، پارەکە دراوەتە دەستی کوڕەکەتەوەو پێیان وتووە کاتی خۆی باوکت ئەم پارەیەی بە ئەمانەت لای ئێمە دانابوو.. پارەکە زۆرەو لە جانتایەکی مامناوەندیدایە..

Cut

دیمەنی – ٧٢٢ – ڕ – عەسر/ن - ئۆفیسی شۆڕش:

(( شۆڕش دایشتووەو سەردار دێت بۆلای دیارییەکی پێیە.. گوڵدانێکی شوشەی بەرزو باریکە، چەند گوڵێکیشی تیایە.. گوڵدانەکە شینێکی ئاسمانیی جوانە، ئەگەر هەبێت چەند لایەکی بە جیا بڵند بێت، واتە بە درێژیی دەرپەڕی بێت بۆ سەرەوە.. شۆڕش زۆر سوپاسی ئەکات و دڵی پێی خۆشەو لەسەر مێزەکەی ناوەڕاست دایئەنێ، مێزەکەش شوشەیەکی ئاوییە.. ))

شۆڕش: خەجاڵەتت کردم سەردار گیان.. هەر زۆر جوانە.

سەردار: شایانی زۆر لەوە جوانتریشی شۆڕش گیان.. بەس تۆزێک مێزەکە بهێنیتە خوارتر جوانتر نابێ؟ (( دەستی ئەداتێ و لەگەڵیا کەمێک ئەیهێننە خوارتر)) ئێهـ ئەوەتا جێی خۆی گرت.

شۆڕش: هەمموو بیرکردنەوەت زەوق و جوانییە.

سەردار: من هەروام.. تۆ پێم بڵێ شۆڕش گیان، لەگەڵ ئەو هەتیوەیا چیت کرد؟

شۆڕش (( گرژ ئەبێ)): سەردار گیان وامان لێ نەهاتووە بۆ پارە کچمان هەڕاجکەین، تەواو.. هەردوو قاچی ئەبڕمەوە بێ بەلایە

سەردار: ئەی بۆ من قسەیەک نەکەم، بە یەکجاریی بەرپرسیارێتیی ئەو کچەت لە کۆڵ بکەمەوە؟ بە ڕاستی جوانەو دڵنیابە ئێستاش نەبێ لە داهاتووا هەر کێشەی لەسەر دروست ئەبێ.

شۆڕش: توخوا ئەوە قسەیە سەردار؟ کەس هەیە کچی خۆی لێ ببێ بە تەوق و بەرپرسیارێتییەکەی بخاتە ئەستۆی کەسێکیترەوە؟ هههە چییە خاڵە شەو و ڕۆژت لێ نەگۆڕابێ؟

سەردار: تۆ پیاوێکی ژیرو وشیاری شۆڕش.. قەت لەو بڕوایەدا نەبووم، بە هەڵە لە قسەکەم تێبگەیت و نەزانی ئەڵێم چی (( شۆڕش هەڵوێستەیەک ئەکا)) با ڕوونتر قسە بکەم.. تۆ ئەزانی من سامانێکی ئەوەندە گەورەم هەیە...........

شۆڕش(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): پێتەوە دیار نییە.. هههەه.

سەردار: بۆ ئەوەی دڵنیا بیت کە زۆر لەوە گەورەترە لە خەیاڵی تۆدایە، من بە دادنووس خۆم قەرزاری هەموو ژیانی تۆ ئەکەم بە بڕە پارەیەکی ئەوە ندە زۆر، کە بە خەویش بیرت لێ نەکردبێتەوە دەستت بکەوێ.

شۆڕش: یەعنی هەر بۆ سەلماندنی قسەکەت ئەوە ئەکەی؟ یان بەرامبەر بەشتێک؟

سەردار: ئەوە خەریکە تێبگەی.. شۆڕش گیان من و تۆ هاوڕێی نزیکی یەکین و ئەوەی من هەمە، با وای لێبکەین تۆو ماڵ و مناڵیشت لەگەڵما بیخۆن.. بەوخوایەی خوایەتی ئەکا، بە هیچ شتێ تەواو نابێ تا ئێمە بژین.

شۆڕش(( بە سەرسوڕمانەوە)): ئێ!! ئێێێێێێ؟

سەردار: ئەوەش ئەزانی کە ژنیشم نییەو ڕەنگە هەر بە مردنم ئاوەوئاو تیاچێ و بۆ کەس جێ نەمێنێ.. جا ئەڵێم بۆچی بۆ خۆت جێ نەمێنێ، یان بۆ مناڵەکانت؟

شۆڕش: جا ئەوە چۆن سەردار؟ مەبەستەکەم تێگەیەنە، باش تێناگەم.

سەردار(( قلقی و شپرزەیی.)): ئەڵێم!!!!.. ئا.. مەبەستم ئەوەیە، با بڵێین..

شۆڕش: ئەوە چیتە بۆ دەموپلت بەیەکا دێت؟

سەردار: ئەڵێم بۆ کچەکە نادەی بە من؟

ــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــ

# (( ئەڵقەی سی و پێنج))

دیمەنی – ٧٢٣ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ئاوا:

(( ئاوا چەند جارێک تێل ئەکا بۆ ژمارەکەی نینا.. نینا وەڵام ناداتەوە.. نائومێ ئەبێت و مۆبایلەکە هەڵئەداتە سەر کوشنی سەکن.. پاش کەمێک زەنگی گوێ لێ ئەبێ و بە پەلە هەڵی ئەگرێ.. بروسکە))

ئاوا(( بێتاقەت)): سڵاو کاک بروسک سەرچاوم ............... ئێستا لە دەرەوەی کۆمپانیام.. ئەمرێکتان هەبوو........... ئای وا ئێوارەیە، ئێمە زووتر دەست هەڵئەگرین............. باشە بەسەرچاوم.. مادام ئیشەکە زۆر گرنگە، وا ئەگەڕێمەوە............. نا نا نا هیچ عەزێت نییە، لە خزمەتتدام.......... سەرچاو خوات لەگەڵ.

(( کە پەیوەندییەکە دائەخاتەوە، مسکۆڵی نینا ئەبینێ کە تێلی کردووە))

ئاوا(( شاگەشکە ئەبێ)): واووووو!!! (( تێلی بۆ ئەکاتەوە))

ئاوا: ١- نازانی چەند دڵخۆشت کردم نینا گیان ببورە ئەو کاتە برادەرێکم لەگەڵا بوو، هەر شاگەشکە بووم ناوەکەتم بینی............... ٢- ئەمە قسەی دڵتە یان بەرپێکردنی سەروەختێک؟ ......................... ٣- تێگەیشتم.. دەستخۆش بای.

(( ئاوا یەک دوو مست ئەکێشێ بە سوکانەکەداو هەردوو دەستی پێوە ئەگرێ و سەری ئەخاتە سەر سوکانەکە))

Cut

دیمەنی – ٧٢٤ – ڕ/ ن – ماڵی شۆڕش:

(( نینا چەند جارێک زەنگی بۆ دێت و کە ئەچێ تەماشای ئەکا ئاوایە، وەڵام ناداتەوە، سەرەتا ئاسایی وەری ئەگرێت و دواتر گرژ.. دوا زەنگ کورت ئەبێ و ئەپچڕێ))

نینا(( لەبەر خۆیەوە)): ئەبێ تێبگەیەنم و کۆڵ بدا، ئەگینا واز ناهێنێ.. (( تێلی بۆ ئەکا مشغوڵە))

نینا: ئای خوایە، ئینجا پەیوەندیی تری لەگەڵایە.. دەی پێنج دەقەیەکیتر. (( زەنگی ئاوای بۆ دێت))

نینا: ١- هیچ شاگەشکە مەبە کاک ئاوا.. دڵنیا بە من هەرگیز ناتوانم لە قسەی باوکم دەربچم، دڵم نایەت بلۆکتکەم ئەگینا شایانی ئەوە بوویت.. تکایە جارێکیتر تێلم بۆ مەکە، با دەستم نەچێتە بلۆک کردنیشت............. ٢- لە کانگای دڵەوە ئەوەم پێوتی و تکات لێ ئەکەم یادگارییەکان بەو جوانییەی خۆیان بهێڵەرەوە با نەشێوێن ............... ٣- زۆر ببوورە بای.

(( نینا وەک نیشاندانی حەسرەتێک، مۆبایلەکە ئەنێ بە دەم و لێویەوەو بە نەرمیی گازی لێ ئەگرێ و ئەیگرێ بە دەمییەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٢٥ – ڕ – ئێوارە/د – ناوبازاڕ:

(( نارەوەن چەند عەلاگەیەکی پێیە بەرەو سەیارەکەی ئەچێت و تا عەلاگەکان بخاتە سەیارەکەوە.. هەندرێن بە جلی دەرەوەی ئیشەوە، نزیکی ئەبێتەوە ))

هەندرێن: ئەو عەلاگانە دانێ نارەوەن خان، لێیگەڕێ من ئەیخەمە سەیارەکەوە.

نارەوەن: زۆر سوپاس هەندرێن گیان، وا گەیشتم بەساقە.

هەندرێن(( الحاح ئەکا )): نەبەخوا ئەمدەیتێ.

نارەوەن: دە نا بەساقە ئەرکە بۆ تۆ (( عەلاگەکانی ئەداتێ و سنوقی بۆ ئەکاتەوە ))

هەندرێن: ئەرکی چی دادەی من خزمەتت ئەکەم.. خۆ بەیانی دێیتەوە نارەوەن خان؟

نارەوەن: ئەیچۆن؟ ئیشێکت هەبوو؟

هەندرێن: نانی بەیانی مەخۆ، تافان بۆ بەیانیی سەروپێی ئامادەکردووە، پێموتووە بەشێکی باشیش بۆ ئێوە دانێ.

نارەوەن: نەبەساقەوبم نەبەخوا، من زۆر حەزم لە سەروپێ نییە لە ساردو سەرمایا نەبێ، ئەویش هەر جارێکی ئەخۆم.. زۆر سوپاس چاوەکەم، مەیهێنە خەسار ئەبێ.

هەندرێن: دەی کە حەزت لێی نەبێ، بۆ ڕۆژێکیتر لەسەر داوای خۆت شتێکت بۆ ئەهێنم.

نارەوەن: هەر سەلامەتیی خۆتان هەندرێن گیان، پێویست ناکا چاوەکەم.. سەرکەوە با بتگەیەنمەوە ئەگەر بۆ ماڵەوە ئەچی؟

هەندرێن: دەستت ماچ ئەکەم نارەوەن خان، نەوەڵا ئیشی بازاڕم ماوە، زۆر سوپاس.

(( خواحافیزی و نارەوەن بەسەیارەکەی ئەڕوات ))

Cut

دیمەنی – ٧٢٦ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٧٢٢ – ئۆفیسی شۆڕش:

(( شۆڕش و سەردار کەمێ گرژ))

سەردار: تۆ بەوە غەدر لە کچەکەش و لە خۆشت و لە منیش ئەکەی.. کاکە هیچ نەبێ با تۆزێ لێم نزیک بێتەوەو تێم بگا، ئەوسا سوێندو قورئانت بخواردایە کە نامدەیتێ.

شۆڕش: سەردار بەسە ئەو بابەتە داخە کەللەییت کردم.. ئەو کچە بە تۆ ئەڵێ مامە بۆ خاتری خوا !!! .تۆ بۆ وا ئەکەی کاکە؟ دەمێ دزیم لە خوشکی خۆم پێ ئەکەیت و هەر ئابڕووشت بردم، دەمێ ئەتەوێ کچەکەم تالانفرۆشکەم.. ئێستاش ئەتەوێ کچەکەمت بدەمێ.. توخوا بە تۆش ئەڵێن پیاو؟ بە ڕاستی بوویتە بە مۆرانەی مێشکم.. من لێرە دانیشتووم بە شەرەفەوە پارەی خۆم پەیا ئەکەم و پێویستیم بە هیچ نییە، هەر هیچ شتێک، ئەوەی دەستم ئەکەوێ زۆریشی زیادە.. بیبڕەوە با شتێ نەکەم پەشیمانیی دادی کەسمان نەدا.

سەردار: تۆ کۆسپی بەردەم هەموو ئیشێکی منی شۆڕش.. باشترە ڕێم لێ نەگری و بمدەیتێ.

شۆڕش: دەی سا وەڵڵاهی کچەکە ئەم قسەیە ببیسێ هەر شێت ئەبێ،

سەردار: ئەی کێ ئەڵێ پێی خۆش نابێ؟

شۆڕش: ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێی واش بێت، ئەیکوژم و ناهێڵم بۆ تۆ بێت.. دە بەسە بیبڕەوە.

سەردار(( هەڵئەسێ)): دەی کەواتە هیچ.. مادام قسەت شکاندم و ڕێ لە بەختەوەریم ئەگریت شۆڕش، شەرتبێ تا سەر گۆڕەکەت نەتبینمەوە، ئەگەر مردیشم نەیەیتە سەر گۆڕم.

شۆڕش: کورە کەسێک هەزارجار نمەکی کردبم و لە ژێرەوە چاوی بڕیبێتە ناموسم، تا ماوی خۆم ناهێڵم پێ بخەیتەوە ماڵی من و حاشا لە دیدارت.

سەردار: ئەگەر لەبەر کچەکە نەبێ سەدی وەک تۆ بە خزمەتکار ڕاناگرم شۆڕش.. تۆ چیت من بێمە ماڵت یا نەیەم؟

شۆڕش: تۆ هەر خۆت سەروفەسساڵت لە خزمەتکار ئەچێ، عەیبە پاشەڵی خۆت نابینی.. هەستە بۆ دەرەوە تا کەرامەتیشم نەشکاندووی، هەرچەندە کەرامەت چییە نیتە.

سەردار: باشە با قسەی تۆ بێ و من بێ کەرامەت بم شۆڕش.. بەڵام داهاتوو ئەیسەلمێنێ کاممان بێ کەرامەتین.

شۆڕش: وتم بۆ دەرەوە، جارێکیتریش نەخەڵەتابی سەربکەیتەوە بەم ئۆفیسەیا.. دەی بۆ دەرەوە.

سەردار(( ئەچێتە دەرەوە)): باشە شۆڕش باش!!! من ئەڕۆم

Cut

دیمەنی – ٧٢٧ – ڕ – ئێوارە/ د – بەردەم کۆمپانیای ئاوا:

(( بروسک بەرەو کۆمپانیاکە دێت، ئاوا دێتە دەرەوە، دوای سڵاو و هاواڵپرسین))

بروسک: بە تایبەت هاتووم سوپاس بۆ گەڕانەوەت، ئێستا لای کاکە ئامۆشەوە هاتم، بە دڵ سوپاسی سنگ فراوانیی و کەسایەتیتان ئەکەم، ماڵتان ئاوا، یاخوا هەر خەڵکی وەکو ئێوە هەبێت.

ئاوا: عەیبە ئەو قسانە مەکە بروسک گیان، لە بەیانییەوە وەرەوە سەر ئیشەکەی خۆت و مامە زوبێریش بگەڕێتەوە جێگاکەی خۆی.

بروسک: ئاگام لەوە نییە کاکە ئاوا گیان، ئەوەی ئێستا مامم پێی وتم شتێکیتر بوو.

ئاوا: کەواتە تۆ ئەوەیانم پێ بڵێ.. ئێمە لە ماڵەوە لەسەر ئەوە ڕێککەوتبووین.

بروسک: بەڵێ باسێکی وا کرا، بەڵام دواتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە نەخۆشخانەیەکی ئەهلی بکەنەوەو کاکە ئامۆو مامم ئیدارەی ببەن بەڕێوە.

ئاوا: ئەی خۆراکەکە؟ کەواتە با بچمەوە بزانم بە چی گەیشتوون؟

بروسک: دایکت بە یەکجارەکیی ئەچێتەوە ئۆفیسەکەی کاکە ئامۆ.. وا ئەزانم ئاوا ڕێککەوتبن.

ئاوا: ئۆوهۆۆ دیسان منیان بەستۆتەوە بە ئێرەوە.. هەهە دەی قەینا با هیچیان بۆ من نەکردبێ.

بروسک: دیارە هەواڵەکەی من بۆ تۆ ناخۆش بوو!

ئاوا: نا.. بۆ من هیچ نەگۆڕا، گوێی مەدەرێ، ئێرەش خراپ نییە، بەڵام گەر حەزت کرد، تۆش ئەتوانی بێیتە ئێرە.

بروسک: زۆر سوپاس ئۆفەرێکی زۆر باشە، بەڵام وا جارێ لەگەڵ ڕێژوان بەو ئیشی مۆبایلە ڕاهاتووین، زۆر سوپاس ئازیزی منیت.

(( ڕۆشتن و خواحافیزییان لە یەکتر بە گەرمیی)) ———— Cut ————

دیمەنی – ٧٢٨ – ئێوارەی درەنگ/ د – ئۆفیسی شۆڕش:

(( بەدەم هاتنە دەرەوەو دوکان داخستنەوە))

**شۆڕش مۆنۆلۆژی ناوەوە:**

ئەبووایە خڵتەی وام هەر نەناسیایە، ئاخر من و ئەم دڵ پیسی موخەنەتە کوجا مەرحەبا؟ بەڵام دڵپاکیی خۆم ئەوەی کرد ئا ئەم بەدفەسساڵە بناسم.. جا کە ئینسان پیس بوو بە هیچ شتێک پاک نابێتەوە، باش بوو بۆ هەتاهەتایە دەسبەرداری بووم.. ئاخر من ئێستا بچمەوە چی بە نینا بڵێم؟ بڵێم ئەو پیاوەی بە مامی خۆت ئەزانی داوای کردووی؟ باوکم بیللاهی متمانەی بە هیچ شتێکی من نامێنێ.. هەر بەردێکی بخەمە سەرو قەت نەیزانێ باشترە، بڵێم نێوانمان تێکچووەو هیچیتر.. ئەرەوەڵڵا ئەوە لە هەموو شتێ باشترە، ئەی چی بکەم، خۆ خۆم ناکەم بە گاڵتەچی کچەکەش.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

_______________ Cut _______________

دیمەنی – ٧٢٩ – ش/ن – ماڵی بروسک:

(( بروسک و چیمەن و ڕێژوان و سەلواو زوبێر))

بروسک: زۆر سوپاس دەستتخۆش بێ مامە گیان.. من هیچم ناوێ، ئیشەکەم باشەو تۆش بۆ ئەو نەخۆشخانەیە پێویستت ئەبێ.

ڕێژوان: ڕاست ئەکا باوکە، ئەو نەخۆشخانەیە پارەیەکی خەیاڵیی تێ ئەچێ.

زوبێر: ئەوەی نارەوەن و مناڵەکانی ناردیانەوە، ئەتوانم بڵێم دەستکراوە ترم ئەکا.. ئەگینا وەکو پێویستیی، پێویستم پێی نەبوو.. لەبەرئەوە هەرچیتان پێویستە لێی هەڵگرن، پارەی ئێوەشە.

چیمەن: هەر کاتێ پێویستیمان بە پارە بێ، ئەی هەر بە خۆت ئەڵێین، کێیتر شک ئەبەین؟

سەلوا: ڕێک وایە مامە گیان، جارێ الحمدولله هیچ پێویستییەکمان پێی نییە.

زوبێر: دەی باشە، با ئەو دەرگایە بە کراوەیی لە بەردەمتانا بێ.

Cut

دیمەنی – ٧٣٠ – ش/ن – ژووری تازەی خدر:

(( خدر٣ دانیشتووەو چا ئەخواتەوە، یەکێک لە چەکدارەکانی دێتە ژوورەوە))

چەکدار: فەرموو قوربان، ئەمرت بە من بوو؟

خدر٣(( کاغەزەکەی نارەوەن دەرئەهێنێ و ئەیداتێ)): بەیانی زوو، تۆ بچۆ بۆلای نەقیب ڕاهۆز، خۆم تێلی بۆ ئەکەم.. پێی بڵێ خدر پێویستیی بەم زانیاریانە هەیە.. وا بکە لە دوو سێ ڕۆژدا دەستم بکەوێ.

چەکدار: ئەی سەرپەرشتیی هێزەکە؟ بیدەم بە کامیان؟

خدر٣: بە جوانڕۆ بڵێ سەرپەرشتییان بکا تا ئەگەڕێیتەوە.

چەکدار: بەسەرچاو (( ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٣١ – ش/ن – ژووری نوستنی نینا :

(( نینا خەو ئەبینێ.... نینا بە قیژەی خۆی بەئەگا دێتەوە، جاریتریش ئەقیژێنێ و باوکی بە ڕاکردن دێتە سەری، ژوورەکەی ڕۆشناییەکی کەمی تیایە، باوکی گڵۆپەکان هەڵئەکا .. نینا لە ئارەق هەڵکشاوە))

شۆڕش: نینا .. نینا گیان! ئەوە چییە باوکە؟

نینا(( پاش تۆزێک هەناسە هەڵکێشان و ڕۆڤانیش ئاوی بۆ هێناوە ئەیخواتەوە)): خەو بوو باوکە، خەوێکی زۆر ناخۆش.

شۆڕش: هیچ نییە مۆتەکە بووە .. ئادەی بیرت ماوە؟

نینا: خەوم پێتەوە بینی باوکە، لێم ون بوویت!.. لە خەوما .........

**<u>بۆ فلاشباک</u>**:

___________ گە ڕانەوەی هەیە ____________________ Cut _____________

دیمەنی – ٧٣٢ – فلاشباک – ش/ن – ژوورێک:

(( دیکۆری خەوەکە بەمجۆرە.. دەرگایەک بە ئاستەم چوارچێوەکەی دیارە.. بە تەنیشتیەوە پەنجەرەیەکی شووشەی کەبس وەک ستۆدیۆی دەنگ.. لەو دیوەوە بڵێسەی ڕۆشناییەکی گەورەی سپی لە دوورەوە دیارە، شۆڕش سەر ئەنێت بە پەنجەرەکەوە، دەم و چاوی باش دیا نییە، بای بای ئەکا.. وردە وردە وەک لەسەر سکە بێت، یان ڕۆشتنی بێ هەنگاو بەرەو بڵێسە سپییەکە ئەڕوا.. نینا هەڵئەسێت دەرگای بکاتەوەو دوای بکەوێ، دەرەوە تاریک ئەبێت و ناو ژوورەکەی ڕۆشنتر))

Cut

دیمەنی – ٧٣٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٧٢٨ – ژووری نوستنی نینا:

شۆڕش(( دەست ئەهێنێ بەسەری نینادا)): قەت لێت ون نابم باوە گیان، خەمت نەبێ.. مۆتەکە وایە، ئەناڵێنی بەدەستیەوە، تا خەبەرت ئەبێتەوە.. ئەوسا زۆر دڵخۆش ئەبی کە خەو بوو.

نینا: خۆزگە هەموو شتە ناخۆشەکان خەو بووایە.

شۆڕش: هەروەک خەو سەیریانکە کچم.

ڕۆڤان: ها فشەکەر خۆ تۆ ئەتوت لە هیچ ناترسم؟ کەچی مۆتەکە ترساندتی؟

نینا (( ڕائەکشێتەوە)): سەرم یەشێت.

شۆڕش: لەسەر پشت مەخەوە کچم.

(( شۆڕش و ڕۆڤان ئەچنە دەرەوەو گڵۆپ ئەکوژێننەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٣٤ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ لەبەر دەرگا وەستاوەو گێلاس سەیارەکەی ئەهێنێتە دەرەوە.. تیرۆژ کەمێک ئیشارەتی ئەکا))

گێلاس: ئامادەی؟

تیرۆژ: بەڵێ.. ئەوە بۆ وا زوو زەنگت کرد ئەم بەیانییە؟

گێلاس: بەیانی زوو نینا تەلەفونی بۆ کردم وتی سەرێکمبە خەوێکی زۆر ناخۆشم بینیووە.

تیرۆژ(( بەدەم سەرکەوتنەوە)): بۆ ئێوە ئەوەنە گوێ ئەدەنە خەو؟

گێلاس: ئەی چۆن تیرۆژ گیان خەو بۆی هەیە، بەخوا خۆم هەر خەوێک ببینم خۆش و ناخۆش، دێتە دی.

تیرۆژ: وەڵا من هەر شتێکم بەسەر بێ، ئیتر بۆ شەوەکەی هەمووی بە ڕەمز ئەبینمەوە هههه.

(( ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٧٣٥ – ڕ/ د – بەردەم ماڵی ڕێژوان:

(( سەلواو ڕێژوان جلی ماڵەوەیان لەبەرایەو زوبێر بە جلی دەرەوە وەستاون، زوبێر سواری سەیارەی خۆی ئەبێ و لە جامەکەوە))

زوبێر: ئا با هەر سەلوا بچێ. تۆ ماڵەکەم بۆ جێبەجێ بکە.

ڕیژوان: باشە باوە گیان، تۆ ئاگات لە خۆت بێ و خەمی هیچت نەبێ.. ئێوارە ماڵێکی خنجیلەی جوانت هەیە.

زوبێر: دەی بتبینم. (( زوبێر ئەڕوا))

سەلوا: شەڵڵا منیشی بگەیاندایەتە دوکان.

ڕێژوان: ڕوحەکەم خۆم ئەتبەم، ستایلی خۆمان تێک نادەین، ئەی سبەی کێ ئەتبا؟ خۆ من ئەم ماوەیە زۆر سەرم قاڵ ئەبێ.

سەلوا: ئاخر وتم با تۆش دوانەکەوی، ئەزانی ماڵ دروستکردن چەند ناخۆشە، زۆر ماندوو ئەبی بەخوا.

ڕێژوان: کچێ خۆم دەست نادەمە یەک پارچەوە، هەمووی بە حەماڵ ئەکەم هههه

(( ڕێژوان و سەلوا ئەچنەوە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٣٦ – ڕ / ن - ماڵی نارەوەن:

(( ئامۆ خۆی ئامادە کردووە بچێتە دەرەوە، نارەوەن چایەکی بۆ تێئەکا ))

ئامۆ: بۆ عەزێتت کێشا دایە گیان؟ خۆم تێم ئەکرد.

نارەوەن: عەزێتی چی ڕۆڵە.. ئەزانی من دڵم لای شەنیایە؟.. نازانم بۆ وا هەست ئەکەم ئەو پارە پەیا کردن و داواکردنەی لە تۆ، بێ مەڵامەت نییە، نهێنییەکی تیایە. هەرچەند ئەکەم سەری لێدەرناکەم.

ئامۆ: نایلێ، هیچ ناڵێ.

نارەوەن: ئاخر دیارە نهێنییەکە بە جۆرێکە تۆ نەیزانی.. ئەی بۆ ئەڵێ بە باوکم بڵێ پارەی خۆمە.. کوڕم ئەوە یەعنی تۆ کراوی بە ئامانج پارەیەکت لێوەربگیرێ، کە کچەکە خۆی پەیای کردووە، مانای وایە تۆ بارقورسیت نەیەتە سەرشان.. هەر بەوەشا بزانە، سەرەتا ناڕاستەوخۆ لە خۆتی داواکردو تۆش خۆتدا بەدەستییەوە. ئەو کچە خۆشی ئەوێی ئامۆ.

ئامۆ(( بەدەم بۆینباخ بەستنەوە )): تا ئێستا دڵنیا نیم.

نارەوەن: با.. بەڵام ئەو پارەیە بۆ ئەوان زۆر زۆرە.. بە چی پەیای کردووەو باوکیشی پێی نەزانێ.. ئەوەش گرێیەکیترە.. باوەڕ بکە تا بەیانی خەو لەچاوم نەکەوتووە، هەر بیرم لێ ئەکردەوە.

ئامۆ: دایەگیان تۆ سەری خۆت بەوەوە مەیەشێنە، هەموو شتێ خۆی ئاشکرا ئەبێ.

نارەوەن: ئەمڕۆو سبەی من شتێکم دەست ئەکەوێ، یاخوا وەک ئەوە بێ کە خۆی وتوویەتی، بەڵام هەرچەند ئەکەم ئەقڵم نایبڕێ ڕاستگۆ بووبێ لەگەڵتا.

ئامۆ(( بەدەم چا خواردنەوەوە )): ئەی ناڵێی ئەو کچە تۆی خۆشئەوێ؟

نارەوەن: با لەوەیان دڵنیام، ژن ژن باش ئەناسێ، هەر بە نیگا کردنیا ئەوەم زانی.. بەڵام ڕەنگە درۆیەکیشی بۆ مەبەستێک لەگەڵا کردبی.. ئەوەیە بووە بە کرمی مێشکم و هەر ئەبێ بیزانم.

ئامۆ: بەڕاست منیش کەمێک خۆشم ئەوێ.. بەڵام ڕێ لە تەشەنە کردنی ئەگرم.. خۆم بە ئەنقەست نامەوێ لەوە زیاتر بێ.

نارەوەن: دەستت خۆش بێ باش ئەکەی.

ئامۆ: دەی من ئەڕۆم.. نیوەڕۆ یاپراخی سڵقەکەیە، دێمەوە.

نارەوەن: باشە کاکە گیان، لە ئەمانەتی خوادا بی.

(( ئامۆ ئەڕوات و نارەوەن تەختەی وایتبۆردەکە ئەهێنێت و دەست ئەکا بە خاڵ دانان و خەت ڕاکێشان))

Cut

دیمەنی – ٧٣٧ – ڕ/ن – ماڵی شۆڕش:

(( شۆڕش و نینا نان و چای بەیانی ئەخۆن، لە دەرگا ئەدرێ و نینا ئەچێ ئەیکاتەوە، گێلاس دێتە ژوورەوە، پاش ئەملاولا ماچکردن و سلاّو))

شۆڕش: یائەڵڵا خێر بەم بەیانییە زووە دادە گێلاس؟

گێلاس: هاتم بۆ لای نینا، بزانم خەوەکەی چی بوو؟

شۆڕش: ئاهـ ماڵم ئاوا کردی نینا، بۆ مۆتەکەیەک ئیشەڵڵا دنیا تێ ئەگەیەنیت؟!

گێلاس: مۆتەکەش هەر خەوە شۆڕش گیان..(( بۆ نینا )) ئادەی نینا گیان چۆن بوو؟

نینا: لە خەوما باوکم خواحافیزیی لێکردم و ئیتر دنیا تاریک بوو.

گێلاس: ئۆییی وا نەڵێی کچێ.. ئیشەڵڵا هیچ نابێ، بەڵام من خۆم خێرێک قەرار ئەدەم و شۆڕش تۆش خێرێ بکەو ئەم ماوەیەش ئاگاداری خۆت بە بەقوربان.

شۆڕش: نیناش ئاگای لە خۆی بێ.. باوەڕ ئەکەی پێی وتووم بۆ ئیش، هەر لە خۆمەوە دڵم لەو هەتیوە ئەترسێ، ئەڵێم توشی بەڵایەکی نەکا، ئیش هەیە، بەس بە من بێ تا ماوە هیچ ئیشێ نەکا.. دادە گیان لە ماڵەکەیا چاوم لێیەتی و پارێزراویشە، خوا یار بێ هیچ ڕوونادا.

گێلاس: دەی ئاخر هەر ماڵەوە ماڵەوەش ناخۆشە، خۆ حەز بە دەرەوەیەکیش ئەکا، ئەگەر ئیشەکەی هەبێ ئەرکیش ناخاتە سەرکەس.

نینا: پورێ گیان من لەبەر خاتری باوکم، بەڵێن بێ هیچ ئیشێ ناکەم.. چۆن دڵی ئەشکێنم؟

شۆڕش: بەڵێن بێ منیش هەرکاتێ پێراگەیشتم، بیبەمە دەرەوەو پیاسەشی لەگەڵ بکەم و هەرچییەکیشی ویست بێ دڵیی نەکەم.. بۆ من چەند نینام هەیە؟

گێلاس: خوا لە یەکتان نەکاو بۆ من هەر بمێنن.

نینا: ئەی پورێ کابرا وەڕسی نەکردووی؟ نایا لای تۆ سۆراخمکا؟

گێلاس: نەوەڵا نینا گیان، ئەوە چەندجاریش پێموتووە بێت پارەکەی بباتەوە، ئەوەی باوکت بۆی داناوە، کەچی هەر ئەڵێ دێم و ناشیەت.

شۆڕش: ئەی وایە، لە چاوبازیی کەوتووە، ئیتر بۆچی بێت.

نینا: ئەی ئیشەکانی ڕێستورانتەکەی خۆمان؟

گێلاس: خوا هەڵناگرێ، تەقسیری نەکردووە، وەک سەعات ئەڕوا، زۆر بێ عەیبە.

نینا: هەر باشە.. دڵم ترسا وتم نەک فەرامۆشی بکات و پەکت بکەوێ.

(( ئیزن خواستنی گێلاس و ڕۆشتنی))

Cut

دیمەنی – ٧٣٨ – ڕ/ن – نوسینگەی خانووبەرە:

(( زوبێر لە نوسینگەکە دانیشتووەو خاوەنەکەی تەماشای سجلێک ئەکا))

خ. نوسینگە: مامۆستا گیان ئەوەی جەنابت داوای ئەکەی، لەوجۆرە سێ چوارێکمان لایە، کە زۆر پاک و تەمیزبێ.. شانسی خۆت سیانیان تازەش دروست کراون و یەکێکی کۆنیشمان لایە.

زوبێر: نا کۆنەکە لێگەڕێ.. ئەوانیتر ئەوانیتریش ئەبێ ناوشار بن و وابێ بە کەڵکی نەخۆشخانەش بێ.

خ. نوسینگە، بەڵێ بەڵێ، تۆ داوای ناوشارت کرد، من دەرەوەی شارت چۆن پێ ئەڵێم؟.. زۆر گەورەشن خەمی ئەوەت نەبێ.. ئەگەر بۆ کرێش ئەتەوێ هەر زۆرمان لایەو لەوانیش فەریعترو جوانترن.

زوبێر: نا نا، بۆ کرێ نا.. جا داوای چی لێ ئەکەن ئەو سیانەیان؟

خ. نوسینگە: تۆ با جارێ بچین بیانبینین، ئەوسا خوا کەریمە، هەر کامێکیانت بەدڵ بوو، لەگەڵ خاوەنەکەیا قسە ئەکەین.

زوبێر: دەی باشە فەرموو با بچین بیانبینین.

خ.نوسینگە: فەرموو مامۆستا، فەرموو.

(( ئەچنە دەرەوە))

———————— Cut ————————

دیمەنی – ٧٣٩ – ڕ/ د – پارکێک:

(( شەنیاو ڕامالْ تەمەن ٣٢- ٣٣ سالْ دانیشتوون))

شەنیا: تۆ ڕای من لەسەر خۆت ئەزانی ڕامالْ گیان، من ئەزانم تۆ کوڕێکی زۆر باشیت، باشترین کەس تەمەننا ئەکا هاوسەرت بێ.. بەلاّم چی لە دلْ ئەکەی؟ کە هەستێکم نەبێ بەرامبەرت؟

ڕامالْ: شەنیا گیان تۆ ئەزانی چەندم خۆش ئەوێی، لە هەر شوێنێکی ڕوخسارت قژت شان و بالْ و قاچ و قول و دەست و مەچەکت بپرسی، وەلاّمت ئەدەنەوە.. من دلْنیام نەک هەست بەوە ئەکەی، بەلْکو لە من دلْنیاتری.

شەنیا: هەموو شتێ ئەزانم.. بەس چی بکەم هەستم بۆ تۆ ناجولْێ، باوەڕم پێ بکە یەک زەڕڕە هەستم ڕووەو تۆ بجولاّیە، ڕەنگە پێویستیت بە هیچ ڕوونکردنەوەیەک نەبووایە.. هەر پەیا کردنی ئەو پارە قەبەیە ٤٠ هەزار دۆلار، قوربانییەکی گەورەیە بۆ من بەساقە، تۆ بلْێی لەوە تێنەگەم، بەلاّم بەدەست خۆم نییە... ئەرێ بەڕاست چۆن ئەو هەموو پارەیەت لای باوکت شاردەوە؟

ڕامالْ: ئای خوایە چەند کەللە ڕەقی؟ پارە پێلاّوەکانتە شەنیا گیان.. لای باوکم وتم وتم سێ دز پەلاماریاندام و بردیان.. داوایەکمان لە پۆلیس تۆمار کردو وتم کەس بەدەرەوە نەبوو لەوکاتەیا، یەعنی شایەتم نەبوو، وەسفی سێ دزی دەموپل هەلْپێکراوم بۆ کردن و ئیتر باوکم وتی، گرنگ ئەوەیە خۆت سەلامەتیی پارە چلْکی دەستە.

شەنیا: قوربانت بم، پێی ئەزانم.

ڕامالْ: نا، پێی مەزانە، داواکەم قبولْ بکەو با هاوسەرگیرییەکەمان بکەین.

شەنیا: سۆری ڕامالْ گیان، شتێک لە ئیرادەی منا نەبێ، ناتوانم بڕیاری لێ بدەم.

ڕامالْ: شەنیا من بەو بایە ئەژیم دێ لەلای تۆوە.. باوەڕ ئەکەی بەهۆی ساردیی تۆوە، زۆرجار بەخۆم ئەلْێم من ئاسنی سارد ئەکوتم؟

شەنیا: ڕێک وایە.. من شەرمندەم لەلای تۆ ڕامالْ گیان، ئەوەی تۆ بۆ منت کردووە کەس نایکا.. بەڵام ڕاستییەکەی من دڵ و هەست و چاوم لەسەر کەسێکیترە، سۆری.

ڕامالْ: هەروا بە ئاسانیی ئەو بڵێسەیەش ئەخەیتە دەروونمەوە؟

شەنیا: ئەبێ بیڵێم.. تۆ ئەوە نەزانی نابێ هیچ کەس بیزانێ.. سبەی دوو سبەی کە هاوسەرگیرییم کردو نەتزانی، توشی شۆک ئەبی.. ئەمە باشترە.

ڕامالْ: یەعنی ئەڕۆی؟ گەڕەک جێ ئەهێڵی؟

شەنیا: زۆری نەماوە!

ڕامالْ (( ئەگری)): بەڵام من گەڕەک پڕ ئەکەمەوە لە تۆ.. دەرگاو بانت بۆ هەتا هەتایە جێ نزرگەم ئەبێ.. تا مابم، چاودێریت ئەکەم، لە هەر کوێ بی لەوێ ئەبم.. من تەنیایی هەڵئەبژێرم و یادەکانی تۆ.

شەنیا: سوپاس سوپاس ڕامالْ گیان، پێ ئەزانم، تەنها داوایەکت لێ ئەکەم، ئەویش ئەوەیە کە هاوسەرگیریم کرد، چۆن ئەتەوێ بمبینی بمبینە لە دوورەوە.. بەڵام تکایە سەرم لێ مەشێوێنە.. هەر کوڕە باشەکە بە، کە یادم کردی با هەر باشییەکانت ببینم.. دە هەستە بابڕۆین.

ڕامالْ: تۆ بڕۆ هەرچی فریشتەی ئاسمانە، خوا بیکاتە چاودێرت و ئاگایان لێت بێ.

شەنیا: خواحافیز هاوڕێ باشەکەم.

(( شەنیا ئەڕوات و ڕامالْ ئەمێنێتەوە ، بێتاقەت دەرئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ٧٤٠ – ش/ د - بەردەرگایماڵی شۆڕش:

Mute

(( دوو کەسی چاودێریی ماڵی شۆڕش ئەکەن.. نینا دێتە دەرەوەو چاوێک ئەگێڕێ، ئەمان خۆیان پەنا ئەدەن خۆ ئەشارنەوە.. دواتر نینا دەرگا دائەخاتەوەو ئەگەڕێتەوە ژوورەوەو دەرگای مدخەلیش دائەخا.. دوو کەسەکە بە وریاییەوە دەمامک ئەبەستن و دێنە حەوشەی ماڵی شۆڕشەوە.. ئاوێکی زۆر لەبەردەرگا ئەڕێژن، بە جۆرێک ئاوی زۆری تیا بوەستێ.. وایەری درێژ دەرئەهێنن و وایەرەکە ڕووت ئەکەن و لە دەرگای دەرەوەی ئەبەستن.. وایەرەکە درێژ ئەکەنەوە بۆ پلاکی هەیوانەکەو سویچەکەی هەڵئەکەن و بەسەر دیوارا یەکیان دێتە دەرەوەو ئەویتر لەودیوەوە ئەمێنێتەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٤١ – ش/ن – نوسینگەی شۆڕش:

(( شۆڕش کڵاشی پەڕۆی لەپێیەو پانتۆڵ و کراسێکی قۆڵکورت، لەگەڵ کەسەکەی خاوەنی شقة مفروشەکەی پیاوەکانی پاشا دانیشتوون))

شۆڕش: کاکە کەی دێن؟ وا بوو بە شەو!

خ. شوقە: ئێستا پەیا ئەبن، ئەوان پەلەیان زۆر زیاترە لە من و تۆ.

شۆڕش: تەلەفونێکیان بۆچی بۆ ناکەیتەوە؟ بەخوا ماڵ و منالّم ڕانەهاتوون، وا درەنگ بچمەوە.

خ. شوقە: ئەگەر شەق لە ڕسقی خۆت ئەدەی ئاساییە برا، ئەچمە نوسینگەیەکیتر، هەرچەندە باوەڕ ناکەم هیچیان مابن.

شۆڕش: نەوەڵا کەی وەختی نوسینگە ماوە؟

خ. شوقە: تەحەمولت بێ هاکا پەیابوون.

شۆڕش: پێنج دەقەیتریش چاوەڕوان ئەبین.. ببورە دوای ئەوە ئەبێ دایخەم کاکە، ئەو ڕسقەشم لە خوا ویست. منالّم تەنیان.

خ. شوقە(( هەر سەرەتاتکێ ئەکا)): بەخوا ئیتر بەزمەکە بۆ من جێ ئەهێڵن.. نە ئەوان هاتن و نە تۆش سەبر ئەگری.

شۆڕش: با ئەم پێنج دەقەیەشی لەسەربێ. (( پاش کەمێک وەستان)) کاکە بەخوا وا دیارە نایەن، ڕاستیان وتووە ئەڵێن شەڕی بەیانیان لە خێری ئێواران باشترە.. بە یارمەتیت دایئەخەم.

خ.شوقە: تۆزێکیتر ناوەستی؟

شۆڕش: نەوەڵا برا یەک چرکەیتریش ناوەستم، دڵم لای منالّەکانمە.

خ. شوقە: دەی دەسەڵات نەما، ئیشەڵڵا بەیانی دێینەوە.

دیمەنی – ٧٤٢ – متبوع - ش/ د – بەردەرگای ماڵی شۆڕش:

(( کەسەکەی دەرەوە چاودێریی ئەکا.. شۆڕش ئەگەڕێتەوەو ئەو ئاوە زۆرەی بەردەرگا ئەبینێ))

شۆڕش: ئەرێ ئەم هەموو ئاوە چییە؟ تۆ بڵێی تەوافەی تەنکیەکە شکابێ و پێیان نەزانیبێ.. جا خۆ ڕێم نییە بڕۆم.. ئەی بۆ وا لێرە پەنگی خواردۆتەوە هههە وەڵا سەیرە، تازە کڵاشەکانیشم هەر تەڕ ئەبێ.. ئا.. با وا بکەم هەر بنەکەی تەڕ بێ، چی بکەم لە ژوورەوە خێرا بۆم وشککەنەوە.. (( خۆی هەلئەدات و کەمێک کڵاش و بنەکەی تەڕ ئەبێ، بۆ ئەوەی نەکەوێ دەست بە دیوارەکەوە ئەگرێ و بە توندیی و بە پەلە دەستی بەر دەرگا ئەکەوێ پێش ئەوەی دەرگا دەنگی بێت

# (( ئەڵقەی سی و شەش))

دەستی بەر دەرگا ئەکەوێت و کارەبا ئەیگرێ ئەیکوژێ.. ئەوی دەرەوە چەپڵەیەک لێ ئەدات یەک دانەو ئەوی ژوورەوە وایەرەکە لێ ئەکاتەوەو فڕێی ئەداتە دەرەوەو ئەوی دەرەوە کۆی ئەکەتاتەوە بە نارێکیی و فڕێی ئەداتە ئەو سەیارەیەوە کە دێت هەڵیانگرێ.. هەموو ئەم عەمەلیانە زۆر بە پەلە ڕوئەدەن))

Cut

دیمەنی – ٧٤٣ – ش/ن –ماڵی شۆڕش:

(( نیناو ڕۆڤان.. ڕۆڤان وێنەیەکی کاریکاتێریی نینای کێشاوە.. نینا ڕاوی ئەنێت و هەر کاتێ پێی ئەگا چەپۆکێکی بۆ دائەوەشێنێ، پێکەنینی ڕۆڤان و ڕاکردنی لەدەست نینا.. نینا ماندوو ئەبێت و ئەوەستێ))

نینا: تۆ بڵێی نەتگرم، وێنەکە هەڵگرە تا باوکم دێتەوە، ئەگەر ئازای نیشانی ئەوی بە.

ڕۆڤان: ئەرێ زۆر دوانەکەوت؟

نینا: با.. قەت وا دوانەکەوتووە.

ڕۆڤان: با تەلەفونێکی بۆ بکەم.

نینا: بۆمکرد، هەر زەنگ ئەڕواو وەڵام ناداتەوە.

ڕۆڤان: تۆ بڵێی شتێک نەبووبێ؟

نینا: نا نا هیچ نەبووە ئیشەڵڵا، ڕەنگە کڕیار هاتبن.

ڕۆڤان: جا بەم شەوە درەنگە؟

نینا: کڕیار کات و ناکاتی نییە، وەک دڵۆپە وایە.. ئەگەر هەر دەرنەکەوت، بچۆ سەرێکی نوسینگەکەی بە.

ڕۆڤان: نەوەڵا ئێستا ئەچم، لەوە درەنگتر یەعنی نیوە شەو!

نینا: پانتۆڵێک هەڵکێشە پێت و برۆ ئاگاشت لە خۆت بێ، دەرگای دەرەوە جوان داخەی، من ناوەوە دائەخەم.

(( ڕۆڤان پانتۆڵێک هەڵئەکێشێتە پێی و ئەڕوا))

تابع ——— Cut

دیمەنی – ٧٤٤ – متبوع – ش/د – حەوشەی ماڵی شۆڕش:

(( ڕۆڤان لە حەوشەوە ئەڕوات و دەرگا ئەکاتەوەو باوکی ئەبینێ کەوتووە.. شپرزە ئەبێ.. ئەچێتە لایەوەو چەند جارێک بانگی ئەکات و سەر ئەنێ بە دڵیەوەو دواتر دەست ئەخاتە ژێر ملی و ئەقیژێنێ))

ڕۆڤان(( دەنگی بەرز)): نیناااااااا

Cut

دیمەنی – ٧٤٥ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی ئاوا:

(( نینا متردده لەوەی بچێت بۆ ئۆفیسەکە، پاش کەمێک ئەبینێ هەندرێن دەرگای ئۆفیس ئەکاتەوە.. شەنیا خۆی پێ ئەگەیەنێت))

شەنیا: بەیانیت باش.

هەندرێن: سەرچاو شەنیا خان، فەرموو!

شەنیا: ئەوە ئامۆ بۆ نەهاتووە؟

هەندرێن: دیارە دەمێکە نەهاتوویت و ئاگات لەو گۆڕانکارییانە نییە ڕوویداوە؟

شەنیا: نا ئاگادار نیم چی ڕوویداوە؟

هەندرێن: ئەی ئێستا نارەوەن خان لێرەیەو کاک ئامۆ بەئیشیترەوە سەری قاڵە.. نارەوەن خانیش ئەمڕۆ نایەت.

شەنیا: ئیشە تازەکەی ئامۆ لە کوێیە؟

هەندرێن: ئاگام لە وردەکارییان نییە، من زۆر ناپرسم.. بەڕاستی نازانم.

شەنیا: باشە خۆم ئەپرسم سوپاس.

(( شەنیا ئەڕوات و هەندرێن ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٤٦ – ڕ/ د – ماڵی شۆڕش:

(( دوو خێمە بۆ پیاوان و ژنان هەڵدراوە.. نیناو گێلاس شیوەن ئەگێڕن، مەلایەکی ژن قورئان ئەخوێنێ و شیوەنەکە کپ ئەبێتەوە تا قورئانەکە تەواو ئەبێ و دواتر دەست پێ ئەکەنەوە..

ئامادەبووان: تیرۆژو نارەوەن و نیناو گێلاس و تافان و سۆمای کچی گێلاس و سەلواو چیمەن و شەنیا (( نابێ تریفەی لێ بێت)) چەند کچێکی گەنج و مام ناوەندو ژنی پیر))

نارەوەن: گێلاس خان دایکەکەم وا لە خۆتان مەکەن، بەخوا گەروابڕوا ناهێڵم ئەو کۆتەڵە بکرێ، ئەوسا مردوومان ئەبێ بە سێ و چوار.

گێلاس(( باوەشی پیا ئەکا)): بەخوا خۆمان بۆ ناگیرێ نارەوەن خان گیان، چی بکەین بەدەست خۆمان نییە ئەزانی شۆڕش چ پیاوێک بوو؟

نارەوەن: هەمووومان ئەزانین گێلاس گیان، بەڵام بەو حاڵەوە کەڵکی کۆتەڵتان پێوە نییە.. نەبەخوا.

گێلاس: باشە باش.. توخوا وا مەڵێ ئەو کۆتەڵە هەر ئەبێ بکرێ، هەوڵ ئەدەم دان بە خۆما بگرم بە قوربانت بم، خۆت تەدارەکی ڕێکخە.

نارەوەن(( ئاماژەی بۆ نینا)): دەی ئاخر وا ئەو کچە مرد، ئەها چی لە خۆی ئەکا؟ با لەبەر خاتری ئەو ئەوە نەکەین.

گێلاس: ئەویش باوکیەتی چی بکا؟ من دڵنیام دوای کۆتەڵەکە ئەو شین و شەپۆڕەی کەم ئەبێتەوە.. ئێستا قسەشی لەگەڵ ئەکەم، توخوا تۆ بڕۆ خەریکی ئەوە بە.. با پێش نانی نیوەڕۆ بکرێ.

نارەوەن: نابێ نا، چۆن چێشتەنگاو ئەوە ئەکرێ.

گێلاس: ئەی چ کاتێ ئەکرێ؟

نارەوەن: سەعات دەوروبەری چوار باشە، ئەوکاتەی پیاوان لە ئێش ئەگەڕێنەوە.

گێلاس: ئێ خۆ پیاوی تیا نابێ؟!

نارەوەن: ئەیرۆ پیاوی چی؟ ئەوە بەس بۆ ژنانە.. بەڵام کە لە کولتوری خۆمانا ئەکرێ، مەبەست لە کاتی گەڕانەوەی پیاوانە لەسەر ئیش و ئەو کەسە ناگەڕێتەوە.

گێلاس(( پڕمەی گریان)): نەوەڵا ئیتر قەت ناگەڕێتەوە.

نارەوەن(( هێوری ئەکاتەوە)): دە بەسیەتی ئیتر، ئێمە چیمان وت؟

گێلاس: باشە بەساقەوبم، تۆ بڕۆ ئامادەیکە، وا منیش بە نینا ئەڵێم کەمێک دان بە خۆیا بگرێ.

نارەوەن(( هەڵئەسێ)): نا با نینا لەگەڵ منا بێ، جل و بەرگ و شتەکانیم بۆ دەربێنێ و جێگەی نوستنەکەیم پێ نیشان بدا.

گێلاس(( بۆ نینا)): هەستە کچم لەگەڵ نارەوەن خانا بڕۆ، ئیشی پێتە.

(( نارەوەن بە ئاماژە پێی ئەڵێ هەڵسێت و نیناش بە بێتاقەتیی زۆرەوە هەڵئەسێت و دوای ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ٧٤٧ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( کرێکارێک لە میوتیدا پارچە کاغەزێک ئەهێنێ و دیالۆگی کورت و ئەڕواو لە چوونە دەرەوەیدا شانی بەر شانی ڕەمزی ئەکەوێ کە بە هەڵەداوان دێتە ژوورەوە ))

ڕەمزی: زۆر ببورە دواکەوتم نیگار خان.

نیگار(( جددیی )): ئیش وەستاوە ڕەمزی گیان، ئەگینا ئەزانم هەموو کەسێ بێ بەریی نییە لە کاروباری تایبەتی خۆی.

ڕەمزی: نیگار خان دەمێکە پێت ئەڵێم کەسێک بێنە هاوکاریم بکاو بێ منیی بە کارگەکەوە دیار نەبێ، من تێکەڵاویم لەگەڵ خەڵکا زۆر دیاریکراوە، کەس ناناسم، تا بیهێنم.

نیگار: بە کچەکەشم وتووەو خۆشم هەر چاو ئەگێڕم بڵێم چی کەس نییە.

ڕەمزی: ئێستا چی هەیە؟

نیگار: سەیری ئەو بێسەرەوبەرەییە بکە لەو کاغەزەدایە، بە نیازن ئاوا دەرگاکە دروستکەن، بچۆ فریایانکەوە بە قوربان.

ڕەمزی(( تەماشایەکی کاغەزەکە ئەکا )): ئۆو ئۆو هیچی بەسەر هیچەوە نییە، ئەی ئەوانیتریان کوێڕا تەواوکرد؟

نیگار: ماشەڵڵایان لێ بێ زۆر گورجن.

ڕەمزی(( پەلەیەتی )): نەک وا دروستی بکەن، با خێرا من بڕۆم.

(( بەخێرایی ئەچێتە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ٧٤٨ – ڕ/ن – مزگەوت – پرسە:

(( لە ڕیزی پیاواندا ئاوا ئەبینرێت وەک یەکەم کەسی مردووەکە، ڕۆڤان و سەردار کە لە تەنیشتی ڕۆڤارەوەیەو جاروبار دەست بەسەریا ئەهێنێ و ئاکۆو دیارو مامە حەمەو مامەیاسین ئامۆو هەندرێن.. لە دانیشتووەکانیشدا هاوڕێ و ئەردەڵان و زوبێرو بروسک و ڕێژوان و هەندێ پیاویترو میرنیزامیش.. هەندێکیان زوو هەڵئەسن و ئەڕۆن.. دەنگی مەلاو بەخێرهاتن و خواحافیزیی زوبێرو سەردار سەلام لەیەک ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٧٤٩ – ڕ/ د – سەرعەرەبانەی خدر٣:

(( چەند کڕیارێک دێن و ئەچن.. دواتر شاموراد پەیا ئەبێ))

خدر٣: هههها ها مممموراد بۆچچچچی هاتووی؟

شاموراد: گەورەم ناوم شامورادە موورادی چی؟

خدر٣: ئاخر تۆ قەت نابی بە شا، بۆیە لێمکردەوە، پێت ناخۆشە؟

شاموراد: نەوەڵا گەورەم پێم ناخۆش نییە.. ڕاستییەکەی بۆ شتێک هاتووم ئاگادارت بکەمەوە.

خدر٣: خێرا بیڵێ لەم کاتەیا کڕیارم زۆر ئەبێ.

شاموراد: گەورەم شتێکم بیستووە، گوایە پاشا بە نیازە کچە بچکۆلەکەی ماڵی دارەوانت پێ بفرێنێ و دواتر خۆی بە پارەیەکی زۆر زۆر بیانداتەوە.

خدر٣: دارەوان کێیە؟

شاموراد: خۆی لە سێدارەدراوە، بەڵام ئێستا دایکیان کۆمپانیاکانیان بەڕێوە ئەبا.. ناوی نارەوەنە.

خدر٣: ئەها یەعنی دەوڵەمەندن؟

شاموراد: هەر زۆر زۆریش گەورەم، بەڵام ئەڵێن حمە خدر ناوێک پارێزگاریان ئەکات و لێشیان ئەخوا، لەبەرئەوە ناهێڵێ کەس بچێ بەلایانا.

خدر٣: ئەها ئەها تێگەیشتم، یەعنی پاسەوانیان هەیە؟

شاموراد: ڕێك پاسەوانێتیان ئەکا گەورەم، تکات لێ ئەکەم مەچۆ بە لایانا، با توشی بەڵایەک نەبی.

خدر٣: من حمەخدرو ناحمەخدر ناناسم و هەر ناشزانم کێیە تا حسابی بۆ بکەم.. بەڵام ئەگەر ئازاری کچەکە نەداو پارەیەکی باشیش بدا بە من، بۆ خراپە موراد، هیچی تیایە؟

شاموراد: گەورەم، لەم ڕۆژەیا خەڵک خۆی لە بەڵاو کێشە ئەپارێزێ.. جا ئەو حمەخدرەش ئەڵێی ئەژدیهای حەوتسەرە، وەک باسی ئەکەن، چەند جار پاشا تەقەشی لێکردووە لەو ماڵە نابێتەوە.. بەخوایەک کە خوایەتی ئەکا، ئامادەیە خۆی لەسەریان بدا بەکوشت، ئیتر کەیفی خۆتە، ئەوەی لەسەر من بوو پێموتی.

خدر٣: کەواتە ئەجەلی بە دەستی من هاتووە، با جارێ پاشا طرکەنەکە خۆیم نیشان بدا، ئەوسا قسەیەکی لێ ئەکەین.. جارێ با بزانم چەند دێتە پێشەوە.. ئیش هەر ئیشە.

شاموراد: بەس توخوا لای پاشا ناوم نەبەیت و بڵێی ئەو پێی وتوم.

خدر٣: نا خەمت نەبێ.. بەڵام تۆش هەرچییەکیترت زانی ئەبێ بە خۆمی بڵێی.

شاموراد: بەسەرچاو.. هەرچییەکم بیست و زانیم شایەنی ئەوەیە بە جەنابت بڵێم، دێم بۆ لات.

Cut

دیمەنی – ٧٥٠ – ڕ/ ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆز))

ڕاهۆز: گەورەم زۆر وریایە.. سەرچاوەی هەوڵەکانی پاشاکەی کردووە بە سەرچاوە بۆ خۆمان، بەڕاستی بێهاوتایە.

سەرکۆ: هەی ئافەرین حمەخدر.. بەڵام چاودێرییەکی باش بخەنە سەر ئەو کچە بچکۆلەیەی دارەوان و بەردەوام ئاگایان لێ بێ و بیپارێزن، نەک دوای حمەخدر هەوڵی کەسێکیتر بدەن ئەوە بکا.

ڕاهۆز: کاک حمە خدریش ئەگەر هەر ئەوەندە بێ خۆم چارەسەری ئەکەم، بەڵام لەوە سڵ ئەکەمەوە، ئەو هاتنەی شاموراد چاو و ڕاو بێ ونیازی شتیتریان هەبێ.

سەرکۆ: کەواتە ئەم ماوەیە ئاگاداری هەموویان بن، خۆت سەرچاوەکان دابەشکە بە شێوەیەکی ڕێکخراو.

ڕاهۆز: وا ئەکەم گەورەم.

Cut

دیمەنی – ٧٥١ – کۆتەڵ – ڕ/د – باخی ماڵی شۆڕش:

(( نوێنەکانی شۆڕش لە باخەکەدا ڕاخراوە، جامانەیەک لەسەر سەرینە کوردییە خڕەکەی و ڕانک و چۆغەیەکی تازەی شۆڕش بە پشتێنەکەیەوە، شاڵ بێ جوانترە، یان ئەوەی دوا دیمەنی لە بەریابوو.. کڵاشە پەڕۆکەی کە لەپێیا بوو لای خواروی شەرواڵەکەیەوە دانراوە.

شیوەنگێڕان هەموو بە جلی کوردییەوە، شینی نیللی تۆخ و ڕەش: گێلاس، نینا، نارەوەن، تریفە، تیرۆژ، سۆما، سەلوا، شەنیاو دوو کچی گەنجیترو پیرێژنێک.. چیمەن کە سکی بەرزەو تافان لە لایەکیترەوە دانیشتوون.

موزیک: مەقامێکی سەفەر.

یەکێک لە شیوەنگێڕان بە دەنگەوە ئەم شیعرەی خوارەوە ئەڵێت و ئەوانیتر بە گشتیی دوای هەر دوو دێڕێک بە ئاوازەوە ئەڵێن: بۆ مەرگی کاکی گەورەمان.

شیعرەکە بە ئاوازێکی سادەوە:

- زەوی و ئاسمان شیوەنیانە

دارو ڕوبار هاژەیانە

+ بۆ مەرگی کاکی گەورەمان.

- کسپەی دڵی بەردو کێوان

+ بزەی بڕیوە لە لێوان

+ بۆ مەرگی کاکی گەورەمان

- ژن و ژاڵ سەریان گرتە قوڕ

کۆڕی پیاوانمان ساردو سڕ

+ بۆ مەرگی کاکی گەورەمان

- ژنان بە کۆتەڵ شین ئەکەن

ئاگر لە دڵیان بەرئەدەن.

+ بۆ مەرگی کاکی گەورەمان.

(( لەگەڵ میوزیک و مەقامی سەفەرەکەدا نۆبە بە نۆبە یەکئەگرنەوە ))

(( ژنەکان هەردوو دەستیان بە هێمای زەڕب ڕێکخستووەو بەو شێوەیە ئەیکێشن بە سنگیانداو بەدەوری جێ و بانی شۆڕشدا ئەسوڕێنەوە بە خاویی.. باشترە گێلاس یان نینا شینگێڕەکە بێ بە گریانەوە.. ئەگەر نەبوو نارەوەن، گریانی زۆر کەم.))

Cut

دیمەنی – ٧٥٢ – ش/د – بەردەرگایماڵی هەڵشۆ:

(( هەڵشۆ لەسەر کورسییەک لە بەرامبەری دەرگاخۆیان دانیشتووە.. پاش کەمێک تریفە بە پانتۆڵ و بۆدییەکی ڕەشەوە دێتەوە))

هەڵشۆ: ئەوە لە کوێ بووی بەم نیووە شەوە؟

تریفە: نیوەشەوی چی هێشتا بانگی خەوتنانی نەداوە. ئەرێ تۆ بهێڵە سەلامێ کەلامێ تاححححح!

هەڵشۆ(( گرژ)): وتم لە کوێ بوویت؟

تریفە: ئێ ئەوە جلەکانم دیارە، خۆ لە ئاهەنگ و کەیف و سەفا نەبووم؟

هەڵشۆ: وتم لە کوێ بوویت؟ فێری وەڵامدانەوەی پرسیار بە.. ڕێک وەڵامی پرسیارەکە بدەوە ئەمسەرو ئەوسەری پێ مەکەو چیرۆک مەگێڕەوە.

تریفە: لە تەعزێکەی کاک شۆڕش بووم.

هەڵشۆ: شۆڕش کێیە؟

تریفە: برای گێلاس خانی بەرامبەری ماڵی باوکمە.. فەرموو چیتر؟

هەڵشۆ: ئەبووایە پێم بڵێی.

تریفە: وەڵا وا بزانم جەنابت هەموو شەوێ تا بەرەبەیان بۆم دێیتەوە، پێم ئەڵێی بۆ کوێ ئەچی و بۆ کوێ ناچی؟!

هەڵشۆ: دنیا وای لێ نەهاتووە پیاو پرس بە ژن بکا.

تریفە: دنیاش دنیاکەی جاران نەماوە، وەک یاپراخ بمپێچیتەوەو خۆشت شەوگەڕیی بکەی.. تۆزێ موحاسەبەی خۆت بکە، ئینجا من.

هەڵشۆ: وەڵا بابە تەواومان کرد، ئیتر دنیا بۆ کاول نابێ؟ ژن ڕێگەو جێگە بۆ پیاو دابنێ؟؟؟؟؟! (( سەیارەی میرنیزام دێتە بەردەرگا)) من ئەڕۆم، ئەو کورسییە بەرە ژوورەوە.

تریفە: ئەقڵم پێی ئەشکێ، شتێ بڵێ نەیزانم.

هەڵشۆ: بیرت دێت یەکەم ساڵی هاوسەرگیریمان.......

تریفە(( قسەی پێ ئەبڕێ)): چیرۆکم بۆ مەگێڕەوە، قسە وا ناکرێ.. لەسەر ئەو ئەو باسە وەڵام بدەوە.

هەڵشۆ: هەی دەمدرێژ.

تریفە: فێربە.. لە قسە کردنا جنێو نادرێ.

(( هەڵشۆ خەندەیەک و بەرەو سەیارەکەی میر نیزام))

تریفە(( دوای چوونە دەرەوەی هەڵشۆ)): ئاوات لێ ئەکەم، جارێکیتر نەخڵەتابی من فێری قسە بکەی (( خدەندەو بزە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٧٥٣ – متبوع – ش/د – ناو سەیارەی نیزام:

(( نیزام و هەڵشۆ لە ناو سەیارەکەدا کە ڕاگیراوەو گڵۆپی ناوەوە هەڵکراوە))

نیزام: ئاخر کاک هەڵشۆ، پاشا ئەو پلانەی دانا کە کچەکەم لێی نزیک بێتەوەو کردوویەتیە سەرم ئەبێ بەردەوام پارەی لێ بکێشێتەوە.. ئێ کچەکەشم لێی بووە بە ڕاست و خۆشەویستیی دروست بووە لە نێوانیانا، ئەڵێ بشمکوژن یەک دۆلاریتری لێوەرناگرم.

هەڵشۆ: ئەمەشتان کردووە بێ من؟

نیزام: ئەمری پاشا بوو چی بکەم؟ خۆ هەر تۆ نیت، ئەویش چاوی بڕیوەتە ئەو ماڵە، بەس بەوەی باشە تۆ بە کەمیش ڕازیت.

هەڵشۆ: من شتێکیترم لە خەیاڵایە، ئەوە بکەی ئیتر پێویستیمان بە هیچ نامێنێ و.. بەڵام پاشاو ماشا تێمەگەیەنە، هەر بۆ خۆم و خۆت. شتێکی زۆر عەننابییە.

نیزام: جا مادام عەننابییە.. پێم بکرێ بۆ نا؟ عەننابییەکانی تۆ زۆر عەنابیین هەها!

هەڵشۆ: گوێبگرە.. بە نیازی کردنەوەی نەخۆشخانەیەکی ئەهلین.. شارەزایەکی کەرەستەی تاقیگەو نەخۆشخانە بێنە بازنەکەوەو من ڕێگەیەکت بۆ دائەنێم، ئەوان متمانەی پێ بکەن و شتەکان بەو بکڕن.. ئیتر بزانە چی ڕووئەدا؟

نیزام: تۆ بڵێی ئەوەندە گێل بن، کەسێکی شارەزایان نەبێت و دەست بدەنە ئەو ئیشە گەورەیە؟

هەڵشۆ: کاکە ماڵە خەزورانی خۆمن و هەر هەموویان ئەناسم، بەسەری خۆم موزەمیدێکیشیان نییە، نەک دکتۆرو شارەزا.

نیزام: ئەوە سەیرە.

هەڵشۆ: تۆ کەسەکە بدۆزەرەوەو پێت ئەڵێم چی بکەی!..جارێ تۆ بڕۆ بمگەیەنە.

(( گڵۆپ کوژاندنەوەو ڕۆشتن)) ___________ Cut ___________

دیمەنی – ٧٥٤ – ش/ن – ماڵی شۆڕش/تەعزێی ژنان:

(( سفرە ڕاخراوەو نانی تەعزێ.. لە دیمەنەکەدا نینا هەر بە جلەکانی کۆتەڵەکەوە، تراکسوت یان چاکەت و بیجامەی ڕەشەوە، پەڕۆیەکی لە سەری بەستووە، جێ فرمێسک و بێڕەنگیی زۆری پێوە دیارە، گێلاس داوای لێ ئەکا نان بخوات، ئەویش لەسەر سفرەکەیەو کەوچکێک ئەخوات و بۆی ناخورێت.. تیرۆژو یەک دوو کچی گەنج و نارەوەن.. زەنگی مۆبایلی نارەوەن دێت، سەیری ئەکاو زۆر بە پەلە هەڵئەسێت و ئەچێتە هەیوان یان حەوشە))

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ٧٥٥ – متبوع - ش/ د – حەوشەی ماڵی شۆڕش:

(( نارەوەن مۆبایلەکەی بەدەستەوەیەو لە ژوورەوە بە خێرایی دێتە دەرەوە))

نارەوەن: ١- ها خدر گیان، تۆ باشی بەقوربان؟ ............ ٢- بەساقەوبم زۆر سوپاس، ئەوە لەو تەعزێیەم زانیوتە برای ئەو گێلاس خانەکەی بەرامبەرمان ئەمری خوای کردووە؟ .......... ٣- داماوە هەر کە دەرگای حەوشەی کردۆتەوە کارەبای لەسەر بووە، ڕێک کارەباکە گرتوویەتی و دەستبەجێ کوشتوویەتی، هەر ڕێک وەک ئەوەی باوکم یادی بەخێر، دواتریش چەند گەڕان و ئاوا کارەباییشیی هێنایە سەر، هیچ کارەبایەکی لەسەر نەبوو، ئیتر داماوە شانسی خۆی، ئەوی باوکیشم هەروا بوو هەر ئەوجارە کارەبای چووبووە سەر کە ئاوای لە باوکم کرد.......... ٤- ئیتر شانسی ئەو دووانە ئەجەلیان بەوە هاتبوو........... ٥- ئادەی بزانم، چۆن؟ ................ ٦- نیزامەکەی باوکی؟ .......... ٧- نا ژمارەم ناوێ ئەوەندە بەسە، تۆ پێم بڵێ کە وەک کێشەیان نییە، یەعنی خاڵیشیان نەگیراوە، ئەی چۆن ئەو ناوەی داوە بە ئامۆ ..................... ٨- کێ بەساقەو بم ........... ٩- ئۆووووو ئەک ڕووت ڕەشبێ شەنیا.. تۆ نەتبینیوە خۆشی چەند داماو نیشان ئەدا.. کەواتە هەموو تێکەڵن و ئەو کچە بۆ ئێمە ڕاسپێرراوە ................ ١٠- نا نا خدر گیان، چۆن ئەهێڵم لێی دوورکەوێتەوە، قوربانی عومری ئەبم، ئیتر بە ئاگاداری برادەرەکەی خۆمان، خۆم لێی ئەچمە پێشەوە ................ ١١- لە من مەترسە حەمەخدر، ئەوەی لەگەڵا ئەکەم تا مردن هەر بیگێڕێتەوە.. خەمت نەبێ ................ ١٢- ئەی چیتانکرد؟ زۆری ماوە؟ ........ ١٣- دەی باشە ئاگات لە خۆت بێ....... ١٤- کاتی خۆش بەساقەوبم. (( مۆبایل هەڵئەگرێت و بەرەو ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٥٦ – ش/ د – بەردەمی دوکانی لەنگە:

(( خدر٣ مۆبایلی بەدەستەوەیە تێل ئەکا ))

خدر٣: من باشم.. ئەی تۆ چۆنی نارە گیان باشی؟ ................. ٢- ئۆو بەداخەوە نەوەڵا.. بە چی؟ ................ ٣- زۆر بەداخەوە، خوا لە گوناحیان خۆش بێت، سەیرە دوو ڕووداو بەوجۆرە لەیەک بچن، وانا؟........... ٤- نارە گیان زۆر کاتت ناگرم لە تەعزێی.. ئەوەی پێتوتم سۆراخمان کرد.. شتی زۆر سەیری تیابوو ............ ٥- ئەو خانووەی تیایداین، هەر بە ناوی میرنیزامەکەوە تۆمارە لە تاپۆ.. هیچ کێشەیەکی لاوەکیان نییە، تەنها ئەوەندە نەبێ کابرا ساختەچییە .................. ٦- بەڵێ نیزام.. نیزام بێ سەیارە نییەو سەیارەی خۆی هەیە، ئەگەر ئەتەوێ ژمارەکەیت بدەمێ؟ ........... ٧- ئەو کەسەی کە بە خاڵی خۆی ناساندبوو، خورشید کەیکاوس نیعمەت؟! ئەزانی کێ دەرچوو؟ ............. ٨- کابرای کە بە ناوی پیتزاوە تلیاکەکەی بۆ ئەپێچرایەوە لە قاوەخانەکەی تریفە .................... ٩- ئەی ڕاسپێرراوە بە دڵنیایی، وا بکە ئامۆ پێی بدرکێنێ کێ ڕایسپاردووە، یان هەر لێی دوورکەوێتەوەو تەواو........... ١٠- ئەوەش باشە، وەک کچی خۆت بیلاوێنەو دڵنەوایی بکە، ئیتر ئەبێ تەمسیلێکی بۆ بکەی، نەکراوەو نەبیستراو بێ ............... ١١- لە تۆ دڵنیام بەساقەوبم.. بەڵام ئیتر بە شێنەیی هەنگاوی بۆ بنێ، وا جارێ من بەم بەزمەوە گیرۆدە بووم ............. ١٢- چاوەڕوانی تەلەفونی ئەو ئەکەم و ئیتر هەموو شتێک کۆتایی دێت ............... ١٣- تۆش ئاگات لە خۆت بێ بەقوربان.. با کاتی زیاترت نەگرم، کاتێکی خۆش.

Cut

دیمەنی – ٧٥٧ – ش/ن –ماڵی تازەی زوبێر:

(( ئامۆو ڕێژوان و بروسک و زوبێر لە هۆڵەکە دانیشتوون))

زوبێر: دکتۆرەکان هەموو پێداویستییەکانیان نوسیوەو لیژنەی خەمڵاندنیش ناوی چەند کۆمپانیایەکی وڵاتانی دەرەوەیان هێناوەتەوە، کە ئەو دەزگەو ئامێرانە دروست ئەکەن.

ئامۆ: ئەی نرخ؟

زوبێر: بەڵێ بەڵێ، چەندین نرخی جۆراوجۆریشیان هێناوەتەوە، بەپێی کوالیتیی و بەردەوامیی و سوان و زۆرشتیتر.. خۆت بچۆو هەمووی بکرە.

ئامۆ: هەهە ئەگەر خۆم بچم بە ساڵیتریش ناگاتە دەستت هەهە.

زوبێر: ئێ لەگەڵ کاکە ڕێژوانا بچن.

ڕێژوان: ناوەڵا بروسک سەری لەو ئیشانە دەرئەچێ.. لیژنەیەکی کڕین بەسەرپەرشتی ئەو دروست بکەن و نوێنەری دکتۆرو شارەزاکانیشی تیابێ.

زوبێر: ئەوە چارەسەرێکی باشە.. خۆ بیناکەت بەدڵ بوو کاکە ئامۆ؟

ئامۆ: بەڕاستی ئەوەم پێخۆش بوو، کە هەم شارەزاکان و هەم دکتۆرەکان بە دڵیان بوو و بە باشترین شوێنیان وەسفکرد.

سەلوا: بەڵام توخوا دوایی فەقیرو هەژارەکانتان بیر نەچێ.

ڕێژوان: هەر زۆر زوو لەگەڵ دکتۆرەکانیشا ئەوەیان باسکردو دکتۆرەکانیش پیاوانە هاتنە پێشەوە.

زوبێر: نرخی سەردانیکردنی نەخۆشمان زۆر کەم داناوە، کە ڕەنگە بە خەیاڵتا نەیەت، دکتۆری شارەزاو زۆر تایبەتمەندیش نەشتەرگەریی هەژاران بە نرخی کەم ئەکەن و ئەگەر زۆر پێویستیشی کردو هەر لە توانایاندا نەبوو، لە داهاتی نەخۆشخانە ئەدرێ و دکتۆریش پارەیەکی ڕەمزیی وەرئەگری.

سەلوا: خوا بە چاکە بۆتان بنوسێ و پاداشتی گەورەتان بداتەوە.

زوبێر: کچم ئەوە ناوبنێ هاوکاریی لە سەردەمێکی ئاڵۆزدا، سەردەمێک کە لە هەوڵی سڕینەوەی سروشتی مرۆڤدایە.. تۆ ئەزانی پێش ئەوەی پارە داهاتبێت، مرۆڤ چۆن ژیاوە؟ هەموو تەنها وێنای ئەکەین، هەموومان ئەگەر ورد بیر بکەینەوە، هەوڵ ئەدەین ژیان بە پێشکەوتنەوە بۆ ئەوێ بگێڕینەوە.. چەند جوانە بە سروشتی خۆمانەوە بژین، نەک کۆمەڵێک کۆت و پێوەندی ئەو مرۆڤانەی بەرژەوەندییان ناونا پێگەیشتن.

ئامۆ: یەکێ گوێی لەم قسانە بێت و نەتناسێ، هەست ئەکا لە ئێستادا ناژیت، لە کاتێکدا ئەو بیرکردنەوەیە مرۆڤ جوان ئەکا، نەک ئەم سیستمەی بۆ پارە، نادادپەروەرییەکی قێزەونی خستۆتەوە.

زوبێر: ئێهـ ئیتر ئەوە دادپەروەرییەکەی ئەو بەرژەوەندیی خوازانەیە، کە خۆڵ ئەکەنە چاوی مرۆڤایەتییەوە و فێڵ لە مرۆڤ ئەکەن لەژێر پەردەو بیانووی جۆراوجۆرا.

ئامۆ: کێشەکە ئەوەیە لێرەش توتییان هەیە مامە زوبێر.

Cut

دیمەنی – ٧٥٨ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆز))

سەرکۆ: کەواتە ئەملاشت جوڵەی تێکەوت.

ڕاهۆز: گەورەم بە حوکمی ئەوەی خەڵکانێک هەن لێناگەڕێن خەڵکی باش هەیبێت و پرۆژەی خێرخوازیی بکا، باوەڕم نەئەکرد ئەمان لە بۆسەکان ڕزگاریان بێت، هەر ئەمزانی بە جۆرێکیتر سەرهەڵئەداتەوە.. ئەبینی خورشیدی بازرگانی تلیاکەکە کراوە بە خاڵی شەنیاکە؟ کەواتە تۆڕەکە بەردەوامە.

سەرکۆ: ئەی وایە نەقیب ڕاهۆز.. خۆ ئەو پاشایەی ئێستا چیرۆک و باسی گەرمە، لە ئەستێرەیەکیترەوە نەهاتووە.. هەر لە پەراوێزی تۆڕەکەدا بووە پێشترو ئاشکرا نەکراوە.. ئەو تۆڕە ئەبێ لە ڕەگەوە هەڵکێشرێ، ئەگینا بەردەوام چاوەڕوانی سەرهەڵدانەوەی بە، بەمەش کۆتایی نایەت.. ئاگات لەم پاشایەیتر نەبڕاوە؟

ڕاهۆز: نا گەورەم، عەقید بەهێزی پۆلیس زۆر باش چۆتە پێشەوە، پێ ناچێ زۆریان مابێ.

سەرکۆ: جموجووڵی هۆشبەر نییە؟

ڕاهۆز: نا گەورەم هەستیشمان نەکردووە هیچ جوڵەیەک هەبێ.

سەرکۆ: مادام خورشید هاتۆتەوە ناوان، ورد چاودێریی ئەو بابەتە بکە، نەک تێهەڵچنەوە.. جارێ خۆت ئیشی لەسەر بکەو مەینێرە بۆ پۆلیس.

ڕاهۆز: گەورەم ئەگەر هەر پارە کێشانەوە بێ، جەنابیشت ئاگاداری دەسەڵاتی پۆلیسە، بەڵام وەک خۆت وتت، نەک سەرهەڵبداتەوە، نارەوەن تەواوی زانیارییەکانم پێ ئەگەیەنێت، بزانین بۆ کوێ هەنگاو ئەنێن.

(( لە میوتیدا دایالۆگ ))

———————— Cut ————————

دیمەنی - ٧٥٩ - ڕ/ن - ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن دانیشتووە.. شەنیا دێتە ژوورەوە))

شەنیا: ئۆو ببوورە نارەوەن خان یەکسەر خۆم پیاکرد، وامزانی ئامۆی لێیە.

نارەوەن: بوراوی کچە جوانەکەم، تۆش هەر کچی ماڵەکەی یاخوا بەخێر بێی.. شوکر دڵخۆش دیاریت.

شەنیا: باشم سوپاس، وایە کەمێکیش دڵخۆشم.

نارەوەن: یاخوا هەر دڵ خۆش بیت چاوەکەم (( خۆی بە کاغەزەکانی بەردەستییەوە خەریک ئەکا)) ئەی باوکت چۆنە؟

شەنیا: زۆر باشن دەستت ماچ ئەکەن.

نارەوەن: تۆزێکیتر ئەچین بۆ تەعزێی برای ئەو ژنەی دراوسێمان، پێت خۆش ئەبێ لەگەڵ منا بێی؟

شەنیا: بە شانازییەوە نارەوەن خان.. کێ ئەوەی دەست ئەکەوێ لەگەڵ خانەدانترین و جوانترین ژنا بگەڕێ.

نارەوەن: مادام باسی جوانیت کرد، ئەوە دڵنیام موجامەلەت کردم.. ڕۆڵە ئێمەو مانان دەستمان لە جوانیی شتووەو بۆ ئێوەمان جێهێشتووە.

شەنیا: وەڵا قەت وامەڵێ، خۆزگە بە نیوەی تۆ جوان بوومایە، ئەگەر ئەگەمە تەمەنی تۆ؟! ئەوسا سەیرمکە، ڕێک ئەبم بە دوو چڵ دەمارو پێستێکی چرچ و شل. هەزار بۆتۆکس و هوێری و هامۆکیش ناگەنە فریام.

نارەوەن: دەوەرە سەر لەم ناوانە دەرکە، دادە گیان ئێمە ئەو شتانەمان نەئەزانی، بەڵام ئێمەش لەوی پێش خۆمان باشتر بووین، داماوانە هەیانبوو نەیانبوو، کلدانێکی پڕ کل و کلچێوکێ، تەواو، ئەوە هەموو جوانکارییەکەیان بوو.. ببوورە ئێستا تەواو ئەبم و ئەڕۆین. (( خەریک بوون بە نوسینەوە)) ـــــ تابع ـــــــــ Cut ـــــــــــ

دیمەنی – ٧٦٠ – متبوع - ڕ/ د – چاپخانەکە:

(( ئەردەڵان دانیشتووەو هاوڕێ بێ ئیشە.. لە باگراوندا نارەوەن و شەنیا، سواری سەیارەکەی نارەوەن ئەبن و ئەڕۆن))

ئەردەڵان: ئەهـ ئەوە هاتەوە.. چاوت نەفرێ ئەویتریش دێتەوە.

هاوڕێ: ئەویتر کێیە ئەردەڵان؟

ئەردەڵان: حەمە خدری دۆستی.

هاوڕێ: ئەگەر تۆ لە ئاهی ئەو نارەوەن خانەو لەسەر بوختانکردن بەو ژنە، هەرچی ئاوەڕۆی ماڵتانە نەگیرا، چیم پێ ئەڵێی پێم بیڵێ.

ئەردەڵان (( پێکەنین)): دەی سا بە قورئانی عەزیم ئەم بەیانییە گونجی حەمامەکەمان گیرا بوو هههە.

هاوڕێ: ئەهـ ئیتر نەڵێی!!

ئەردەڵان: کورە بابە بوختانی چی؟ هەر زانی نارەوەن خان نایەتەوە، بە ناوی پشوو وەرگرتنەوە، ڕۆشت و نەگەڕایەوە.. هەر خەبەری پێ بگا گەڕاوەتەوە، بزانە دێتەوە یان نا.. ئەوسا دوو بەدوو لەو ئۆفیسە دائەنیشنەوەو منیش مەرحەبایەکی تۆ ئەکەم.

هاوڕێ: ئێ خۆ ڕێی تێ ئەچێ مۆڵەتەکەی تەواو بێ و بگەڕێتەوە، نەک ئەوەی تۆ ئەیڵێی گەمژەی هەتا ئێوارە گەمژە، ئیتر نازانم بۆ شەوەکەش گەمژەی یان نا؟

ئەردەڵان: کورە بابە لە خۆمەوە قسە ناکەم.. ئەوە پێشتریش پێم وتی ئەو چەتیوەی ئێستا لەگەڵ نارەوەن خانا بوو، یاری کاک ئامۆیە، پێتوتمەوە بوختانچی.. ئەوە خۆ بۆت دەرکەوت، هەموو خێزانەکەشیان پێیان زانیون و هاکا بوون بە ژن و مێردیش.

هاوڕێ: بەخوا ئیتر تۆ هیچیش تێناگەیت و لە دەمیش ناکەوی.

(( هاوڕێ لێی دوور ئەکەوێتەوەو ئەویش ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٧٦١ – ڕ/ن - ئۆفیسی وەکالەت:

(( تیرۆژ دانیشتووەو دیار دێتە ژوورەوە))

دیار: دە بچۆ سەرەوە چاوەکەم کەمێ لەوێ دانیشە با منیش بچم چاوێ گەرمکەم.

ئێرە داخە دوو ڕۆژە داخراوە کێشەت چی بوو؟

تیرۆژ(( سەرقاڵی کۆمپیوتەرە)): بەساقە ئێرە کێشەی داخستنی نییە، کێشەی کەڵەکە بوونی ئیشی هەیە، هەر تەواویکەم دێمە سەرەوە.

دیار: ئەمشەو تا بەیانی نەیانهێشتووە خەو بچێتە چاوم، هەر دە دەقە جارێک یەکێک ئەهات و فلَق خەبەری ئەکردمەوە.. ئینجا هەستەو دەستیان پێ ئەکرد.. کاکە جێ نەماوە برا جێ نەماوە، هیییییچ!

تیرۆژ: وەڵا ڕاستە، خەڵکیش کە جێی حەوانەوەی نەبوو، ئیتر هەرچۆنێک بێ ئەیەوێ جێیەک بۆ خۆی بکاتەوە ئەگەر لە هۆڵی ڕیسێپشن وساڵۆنیشدا بێ.. تۆ بڕۆ، وا منیش هاتم، زۆرم نەماوە.

دیار: توخوا تۆزێ خێرا بەساقەوبم.

تیرۆژ: خوا نەکا، چارەکێکیتر لای تۆم.

(( دیار ئەڕوات و تیرۆژ چاپکردن))

Cut

دیمەنی – ٧٦٢ – ڕ – عەسر / د – عەرەبانەی حەمەخدر:

(( خدر٣ لەسەر عەرەبانەکەیەتی، ٢ کەس داوای پاقلەو نۆکی سەفەری ئەکەن، لەو کاتەدا تێلی بۆ دێت، سەیرێکی ئەکاو وەڵام ناداتەوە.. دووانەکە بەڕێ ئەکات و پاش کەمێک تێلی بۆ ئەکرێتەوە))

خدر٣(( بە دەنگی دێهاتییانە)): هەهەهەلاو بااڵێ......... بەڵێ ئەوکاتەی خەڵکی لێ بێ ناتوانم جوابت بدەمەوە.................. ئێ باش، کەی و لە کوێ یەک ببینین؟

# (( ئەڵقەی سی و حەوت))

............ ئەک برای خۆم ڕۆ نەبێ، جا بۆ وا دوور پورزا؟.................... دەی باشە باش، ئەگەر نزیکت بکردایەتەوە باشتر بوو، بەخوا ئەوە زۆر دوورە............ باشە دوایی لەگەڵ کوڕەکانیش قسە ئەکەم...... دەی خواحافیز.

(( هاوکاری ئامۆژنە ڕەعنا دێتە لایەوە)): ئەو بوو؟

خدر٣: ئا چایەکم بەرێ هاوکار (( بە سوکیی)) خۆی بوو، شوێنێکی دووری هەڵبژاردووە بۆ بەیانی، ناوشاخ و داخەو ڕێی دەرچوونی کەمە، چاودێریی هەموو دەشتاییەکانیش ئەکا، بە دڵم نییە..

(( هاوکار چاکەی تێکردووە، لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٧٦٣ – ڕ/د – چایخانەیەکی جیاواز:

(( هەڵشۆو نیزام و شاموراد لە چاخانەیەک لە دیوی دەرەوە دانیشتوون))

هەڵشۆ: کورە بابە ئیبلیس گرەویان لێ ناباتەوە.

نیزام: من پێموتی ئەوەندە گەمژە نیین بەوجۆرەی تۆ بیری لێ ئەکەیتەوە.

شاموراد: گوێرەکە ئاوایە ئیتر(( ئاماژەی هەڵشۆ ئەکا)).. تەماعی کردۆتە سەروەت و سامانی ماڵە خەزووری! هههەه.

(( پێکەنینی شامورادو نیزام))

هەڵشۆ: ئەوە بە منت وت گوێرەکە؟

شاموراد: ئەی کەرێکیترت بینیوە تەماع بکاتە ماڵە خەزور؟ لە خۆت زیاتر؟.. ڕۆڵە هەرچییان هەیە هی خۆتە.. عەیبە عەیب تۆزێ فامت بێ.

هەڵشۆ: کورە سێ ئەژدیها لەسەر خەزنەکە کەوتوون، هێزێک نییە بتوانێ هەڵیانسێنێ و بەشی یەکێکیتری لێ بدرێ.. ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ بە تایبەت خەسووم، نارەوەن نارەوەن، هەر ئاگری قورەتە.

شاموراد: ئەرێ پاشاش دیارە باشی ئەناسێ، بۆیە ئەو جاری دوایی کە بینیم وتی زۆر بە پەلە بە نیزام بڵێ کچەکەی لەو ژنە دووربخاتەوەو نەهێڵێ بیبینێ.. ئەوە بە نیزامیشم وت، ئەیوت بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ هەموو قسەیەکی لێ دەرئەهێنێ.

هەڵشۆ: ڕاست ئەکا، جانانەی وەک خۆی نییە پیرێژن!

نیزام: ئەرێ شکڵی ژنە سیحربازەکەی سەر گسکەکەی تیا نییە، ئەوی ئەفلام کارتۆنەکە؟

هەڵشۆ: شەڵڵا لەو بچووایە، هەر زۆر ڕەزاقورسترە.

(( پێکەنین) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٧٦٤ – ش/د – حەوشەو باخی ماڵی شۆڕش:

(( نینا بە جلی ماڵەوە تراکسودی ڕەش.. هەر ئەگری و ڕۆڤان و گێلاس و ئاکۆ دانیشتوون))

نینا(( بە گریانەوە)): پورێ توخوا ئەم خانووەمان بۆ بفرۆشن، وەڵاهی چاوم بەرایی نادا تیایا بێم و بچم، لە هەر شوێنێکیا دنیایەک یادگارییم بیر ئەکەوێتەوە.

گێلاس: وا زوو ناکرێ کچم، تازە بوو بە وەرەسە، هەتا ساغ ئەکرێتەوەو...........

ئاکۆ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): وایە بەم دەمودەستە ئەوە ناکرێ، بەڵام ساغکردنەوەی بۆچییە؟ هەردوو مناڵەکە ئیمزای ئەکەن و تەواو.

نینا: ئەوە کێشە نابێ، ئەیدەین بە پارێزەرو خۆی چارەسەری ئەکا.

ئاکۆ: بۆ ماوەیەک وەرنە ماڵی ئێمە کچی خۆم، تا تۆزێ برینەکە سارێژ ئەبێ.

نینا: قەت قەت ئەم برینەم سارێژ نابێ بەخوا.

گێلاس: خوا خراپتر نەدا.

ئاکۆ: گڵ مەیلبڕە کچم.

نینا: قەت گڵ ناتوانێ مەیلی من بۆ باوکم ببڕێ، نەبەخوا...(( بێدەنگیەک)) بەخوا هەر کە خەوەکەم بینی زانیم باوکمم لەدەستچوو.. شەرتبێ تا ماوم هەرچییەکی حەز لێ بووبێ ئەوە بکەم و هەرچییەکی پێ ناخۆش بووبێ نەیکەم.. (( بە گریانی زۆرەوە)) بەخوا باوکە گیان تا مردنم لە دڵما ئەتپارێزم و وا ئەزانم بەردەوام لەگەڵما دێیت و ئەچیت، هەزار ساڵ بژیم، تۆش لەگەڵما ئەژیت باوکە گیان.

(( ڕۆڤان ئەگری و ئەچێتە ژوورەوە))

گێلاس: کچم لەبەر خاتری ئەو کوڕە دان بەخۆتا بگرە.. بینیت چی لێهات؟ ئەو دەری نابڕێ، ئەیکا بە مەراق و ئەیکوژێ، ئەویش بڕوا باش ئەکەی؟

نینا: چی بکەم پورێ گیان ناتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم، خەریکە شێت ئەبم، زۆر زۆری بیر ئەکەم.

ئاکۆ: وا ئیتر میوان کۆتایی پێ هاتووە، هەستن با بچین بۆ ماڵی خۆمان، ئەم ماوەیە لەوێ بن، تا بزانین خوا چی ئەکا؟

نینا: بە قوربانی خوابم، خۆ تازە باوکم بۆ ناگێڕێتەوە؟

ئاکۆ: مەبەستم ئەوەیە ئەم خانووە بفرۆشین و لای خۆمانەوە خانوویەکت بۆ بکڕین و ئێ وردە وردە بچیتە سەر ئیشێک و .............

نینا(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): نا نا توخوا باسی ئیش مەکە، باوکم وتی حەز ناکەم بە هیچ جۆرێک ئیش بکەی.

گێلاس: با جارێ بڕۆین، بڕۆ دەست و دەم و چاوەکەت بشۆو ئەو کورەش هێمنکەرەوە کچم.

نینا: باشە پورێ گیان.

گێلاس: دەی دەرگاو بانیش جوان قایمکە وا زوو ناگەڕێیتەوە.

نینا: بەڵێ باشە.

(( نینا هەڵئەسێ و ئەچێتە ژوورەوە، ئاکۆو گێلاسیش هەڵئەسن و کورسییەکان ئەبەنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٦٥ – ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و تیرۆژ))

تیرۆژ: دایکە زۆرم بەزەیی بە نینایا ئەهاتەوە، خۆمم بیرکەوتەوە کاتی تەعزێکەمان.

نارەوەن: ڕۆڵە کۆست کەوتن زەحمەتە یاخوا کەس نەیبینێ.. ئای ئەگەر بە من ئەڵێی؟ چەندجار کۆستی گەورەم کەوتووە!

تیرۆژ: دایکە کامەیان لە هەمووی گەورەتر بوو، کامیان تۆی تێکشکاند، باوک؟ برا؟ دایک؟ مێرد؟

نارەوەن: هەر یەکەو ئازاری خۆی جیایە کچم، من ڕێک لە تەمەنی ئێستای نینایا بووم، کە باوکم ڕێک وەک باوکی ئەو کارەبا گرتی، ئەویش هەر خەتای کلاشەکانی بوو تەڕ ببوو، ئەگینا تیا نەئەچوو.. بە ئێستاشەوە هەر وەک ئەوان، کەس نەیزانی ئەو ئاوەو بەو هاوینە چی ئەکرد لەوبەر دەرگایەی ئێمەیا، ئەها، ئەمانیش ئەڵێن بەس خۆزگە بمانزانیایە ئاوی بەردەرگاکە لە کوێوە هاتبوو؟.. من و باوکم میانەمان زۆر زۆر خۆش بوو..........

تیرۆژ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): وەک من و باوکم!

نارەوەن: کچێ وەک ئێوەی چی؟ باوکم وایئەزانی ئەو ئاسمانە کون بووەو منی لێ کەوتوومە خوارەوە.. یادی بەخێر، بۆ دایکم مناڵ بووم، بەڵام جوانەمەرگی برام، کە هەر مانگێک دوای ئەوەی باوکم بوو، سەیارە لێیداو تیاچوو.. ئیتر من دنیام لێ بوو بە شەوەزەنگ، بەو هەموو برینە گەورەیەوە، هیچ چارەسەرێکم نەما ئەوە نەبێ جواب بۆ باوکت بنێرم بێتە داوام.. منیش هەر وەکو نینا دووساڵ بوو خوێندنم تەواو کردبوو، زۆر سەیرە زۆر شتمان لەیەک ئەچێ.

تیرۆژ: جارێکیتریش گێڕاتەوە کە باوکم زۆری خۆش ویستبووی.

نارەوەن: هەر لەوەیا نەبوو.. جا ئەگەر نازکێشان و لوتفی باوکت نەبووایە، کە باوکی ڕەحمەتیم دڵی پێی نەئەکرایەوەو بە ئاشکرا ئیزنی دابوو و شووم بە هەر کەسێکیتر بکردایە، باوەڕ بکە ئەبووایە خۆم بکوشتایە.

تیرۆژ: بۆ باوکم چی ئەکرد بۆ ئەوەی ئارام بگری؟

نارەوەن: تا دوو ساڵ زیاتریش من هەموو جومعەیەک لەسەر قەبران بووم، ئەو ئەیبردم، دوای ئەوەش زۆری لێ ئەکردم بچینەوە بۆ سەرقەبران، من کۆڵم دابوو، ئەو کۆڵی لێ نەئەدام.

تیرۆژ: تۆی خۆشئەویست؟ یان خەمی باوکتی بوو و ئەیویست لە گۆڕەکەیدا ئاسوودەیکا کە بۆ کچەکەی باشە؟

نارەوەن (( فرمێسک دیارە لە چاویا، یان هاتبێتە خوارەوە)): هەردووکیان بوو.. هەرکات دڵم پڕ بووایە، بە دیاریی و چوونەدەرەوەو بەشداریی لەگەڵماو لوتف نواندن، نەیئەهێشت خەمەکەم قووڵتر بێت و گریانم درێژە بکێشێ.. من هەموو ئەوانەیم لەبەرچاوەو ڕاستت پێ بڵێم، بۆ ئەوەی تۆو کوڕەکان خەفەت نەخۆن.. بە دزیی ئێوەوە ئێستاش بۆی ئەگریم، بەڵام زۆر نا، جاروبار.. چونکە ئێمەومانان تەمەنی ناسکیی ئێوەمان نەماوە، ئێمە جیرِ بووینەتەوە لە خەفەتا.

(( تیرۆژ ئەگری بە هێمنیی تەنها فرمێسک بە چاویەوە ئەبینرێت، ئاگای لە خۆی نییە))

نارەوەن (( سوعبەت)): هەستە هەستە بچۆ دەم و چاوت بشۆ، خۆ دەستی پێکردەوە.. جارێکیتر هیچت بۆ ناگێڕمەوە .

تیرۆژ: کوا من ئەگریم دایکە، تۆ خۆت ئەگریت (( چاوی ئەسڕێ))

نارەوەن(( چاوی ئەسڕێ)): کەواتە هەردووکمان ئاگامان لە خۆمان نییەو ئەگرین.

(( پێکەنین و گریانی تێکەڵ و چاوسڕینەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٦٦ – ڕ/ د – بەردەمی خانوە تازەکەی خدر:

((سێ سەیارە وەستاون ، یەکیان بەرزو دووەم میک زەمینییەک و ئەویتریشیان سەیارەیەکی شڕەی وەک دایۆو بی ئێمی کۆن و یان ئۆپڵ و ئۆزمۆبیلی کۆن .. خدر٣ لە ناوەڕاستی کۆمەڵە خزمانی خۆی وەستاوە، وەکو ئەفسەر ئاماژە بۆ شوێن و پێکەوە بوونی چەکدارەکان ئەکا.. خۆی هەر دەمانچەیەکی پێیە))

خدر٣: ئێستا هەموو شوێنی خۆتان ئەزانن.. لەبەرئەوە لەوێش بیرچوونەوەو هەڵە نابێ ڕوودا.. چونکە تیائەچن ها.!!!

چەکدارەکان: فەرمانتە.

خدر٣: دەی دەستبەکار بن دەرئەچین.

(( هەموو بە پەلە ئەچنە سەیارەکانەوە، خدر٣ خۆی ئەچێتە پێشەوەی بەرزەکەو سێ چەکدار لە دواوە دائەنیشن، ئەوانیتریش دابەش ئەبن))

Cut

دیمەنی – ٧٦٧ – ڕ / د – ژێر داریک لەسەر شەقامێکی گشتیی:

(( شەنیا وەستاوە ))

**شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

باوکم زاواکەیان ئەناسێ؟ عەننابییەکە.. لە داوێکی زۆر گەورە ئەچێ و منیشیان تێوە گلاندووە، ئەم کوڕە بەو ئاسانییە لەژێر دەستیان دەربازی نابێ.. مانای چییە زاواکەیان خەسووی بە خراپ وەسفکردووە بۆ باوکم؟ تۆ بڵێی باوکم ڕاست بکا؟ .. هیچ تێناگەم و هەر کۆپی پەیستیشیان بۆ ئەکەم، ئەوان هەرچی ئەڵێن من لێرە بەمی ئەڵێمەوە.. دەردتان لەگیانم!! ئائێستا ئەزانم چیتان پێ ئەکەم.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( سەیارەکەی ئامۆ دێت و شەنیا سەرئەکەوێ ))

شەنیا: مەڕۆ، بوەستە، من ئەبێ دابەزمەوە، تەنها بۆ شتێک سەرکەوتم.

ئامۆ(( گرژ )): هیچیتر ماوە شاردبێتتەوە؟

شەنیا(( هەڵوێستەیەک و بە پەلە قسە کردن )): هەر زۆر زۆریش، گوێ بگرە.. من بەکارهاتووم بۆ سەرنج ڕاکێشانی تۆو پارە لێ کێشانەوەت، زۆر دوور نییە دەستی زاواکەتانی تیابێ، نە ئەو کەسە ئەناسم کە ناویم دایتێ گوایە خاڵمەو لە زیندانایە، نە خانوومان فرۆشتووە، نە خاڵیشم کەسی کوشتووە، باشە؟

ئامۆ: هەموو ئەمانە ئەزانم، ئەی ئەو پارەیەی دات بە من و بە ناوی خۆمەوە دامەوە بە باوکت؟

شەنیا: بە هەزار فرت و فێڵ پەیام کرد، نازانم بۆ؟ بەڵام ویستم پارە لە تۆ نەکێشرێتەوە.. گوێ بگرە، ڕەنگە بەزەیی بووبێ، یان خۆشم ویستبی، لە هەردوو بارەکەدا تۆ لەسەرت نییە منت خۆش بوێ.. ناتوانم هاوسەرگیرییت لەگەڵ بکەم بە بوونی ئەو هەموو تەڵەکەبازەوە، بڕۆ خۆت ڕزگارکە لە من.. من هیچ نیم بۆ تۆ.

ئامۆ: ئازارتدام بەوەی درەنگ ڕاستییەکانت درکاند، بەداخەوە، خۆشمویستی، حەزم نەئەکرد بگەینە ئەمە.. ماڵی ئێمە ماڵێکی ئاسان نیین فێڵمان لێ بکرێ، ئەمە قسەی ناو خەڵکە شەنیا گیان.. باوکت خۆی و تۆشی بە هەڵەدا برد، ڕەنگە لە زروفێکیتردا یەکترمان بناسییایە زۆر ئاسوودە بین بە هاوسەرگیریی و پێکەوە ژیان.. بەڵام تازە کار لەکار ترازا هیچتان تیا نەهێشتەوە بۆ لێخۆش بوونیش.

شەنیا: داوای لێبوردنم لێ نەکردی، وتم خۆت ڕزگارکە ئامۆ! ئێستاش تۆ هیچ زیانێکت نەکردووە، ئەوی ئەبێ بە قوربانیی بۆ تۆ منم، کەسیتر نییەو منیش بەو قەدەرە ڕازیم.

ئامۆ: بڕۆ.. گلەیی بێ لە درەنگ درکاندن و سوپاس بۆ ئەوەی خۆت بە ئاشکرا وتت.

شەنیا(( دەرگا ئەکاتەوە)): ئیتر نامبینیتەوە ئامۆ گیان.. خۆشم ئەوێی، تا ئەمرم لە بیرت ناکەم.

ئامۆ: منیش خۆشم ئەوێیت و لە بیرت ناکەم.. ئیتر قەدەرەکە ئاوایە.

(( شەنیا دائەبەزێت و دەرگا دائەخاتەوەو تەماشای ئامۆ ئەکا تا لە چاو ون ئەبێ.. ئامۆ بە بێ تەماشا کردنی ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٧٦٨ – ڕ/ د - بەردەمی کارگەی ڕاماڵ:

(( سەرچڵ گەنجێکی تەمەن نزیکەی ٣٢ – ٣٤ ساڵ.. دێتە بەردەرگای کارگەی ڕاماڵ.. ڕاماڵ بە خێرایی دێتە دەرەوەو سڵاو و ماچکردنی ئەملاولای یەکتر))

ڕاماڵ: با بچینە سەرەوە.

سەرچڵ: ناتوانم ئیشم زۆرە، هەر هاتم چاوێکم پێت بکەوێ.

ڕاماڵ: نا نا مەسەلە ئەوە نییە، تۆ هەر ئەم بەردەرگایەت پێخۆشە ناتەوێ بێیتە سەرەوە نازانم بۆ؟

سەرچڵ: من و تۆ هاوڕێی گیانیی بە گیانیی یەکین ڕاماڵ، هەردووکمان کەسیتر شک نابەین، ڕاستیەکەی من مەبەستم بینینتەو هیچیتر، ئیتر لە هەر شوێنێک بێ.

ڕاماڵ: باش ئەزانم، گاڵتەم لەگەڵ کردی.

سەرچڵ: هیچ دەنگی نەبوو؟ دەرنەکەوتەوە؟

ڕاماڵ: نا شەنیا چوو، بوو بە ڕابردوو.. بەڵام ڕەنگە ماوەیەکیتر بۆ شتێکت ڕاسپێرم سەرچڵ گیان.. وەک خۆت وتت لە تۆ زیاتر کەس شک نابەم.

سەرچڵ: عەشق عەشقێنەیە دیسان؟

ڕاماڵ: شتێکە لەو بابەتە.

سەرچڵ: دە وەک سەری بابەتەکەت دەرخست باسیکە.

ڕاماڵ: ڕاستییەکەی زۆر دڵنیا نیم، با کاتی خۆی بێت، ئەویش ئەزانی.

سەرچڵ: بەقسەی من ئەکەی؟

ڕاماڵ: ئەی بۆ نا؟ بە قسەی تۆ نەکەم کێ هەیە بەقسەی بکەم؟

سەرچڵ: بە ڕای من تۆ دەست لە کچان هەڵگرەو بەدوای دڵداریا مەگەڕێ ڕاماڵ گیان، بە من و هاوڕێیانیترو دایک و باوکت بڵێ، یەکێکت بۆ بدۆزینەوە بۆ هاوسەرگیریی.. ئەگینا لەمەشا هەر توشی شکست ئەبی.

ڕاماڵ: دە قسەی سەیر؟ بۆ؟

سەرچڵ: ناوچەوانی تۆو دڵداریان نەوتووە هەهە بۆت نایەو کچان بە خۆت ڕازی ناکرێن.

ڕاماڵ: جا ئەوە شوومییە؟ یان سەرو پۆتەڵاکم ناشرینە؟

سەرچڵ: هەهە ڕەنگە هیچیشیان نەبێ و هەردووکیشیان بێ.

Cut

دیمەنی – ٧٦٩ – ڕ/ د – ڕێی خارجیی:

Mute

(( سێ سەیارەکە، بە ڕێگاکەدا ئەڕۆن و ئاماژەی جادەیەکی گڵ ئەکات و سەیارەکان لائەدەن و ئەچنە سەر جادەی گڵ و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٧٧٠ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی گێلاس:

(( ئاوا لە دەرگا ئەدات و ڕۆڤان دەرگا ئەکاتەوەو لایەکی دەرگاکە ئەگرێ ئاوا نەچێتە ژوورەوە..))

ئاوا: چۆنی ڕۆڤان گیان باشی باوکە؟

ڕۆڤان(( گرژ)): سوپاس کاک ئاوا، فەرموو!

ئاوا: ئەزانم تازێباری ڕۆڤان گیان، وەک برای خۆت سەیرمکە باوانم، من زیانتان پێ ناگەیەنم.. هەر لەبەردەرگا بوەستم؟

ڕۆڤان: نینای خوشکم حەز ناکا بتبینێ، ئەڵێ هەر شتێ باوکم پێی خۆش نەبووبێ نایکەم.

ئاوا: ئەتوانی بانگی بکەیتە دەرەوە؟

ڕۆڤان: نا ببورە، ئەو غەریبە نابینێ.

ئاوا: من غەریبە نیم ڕۆڤان گیان، وتم برای خۆتم.

ڕۆڤان: ببورە، ئەگەر ئەمرێکت نییە ئیشم هەیە، خواحافیزت بێ. (( دەرگا دائەخاتەوەو ئاوا جارێ لەبەر دەرگایە.. بە هێمنی ئەچێ بۆ سەیارەکەی))

ئاوا(( لەبەرخۆیەوە)): ئەمیش هەر کوڕی باوکە سەگەکەیەتی.. دەی چاویان دەرئەهات، شەرتبێ تا ماون لێیان نەپرسمەوە، وەک ئەوەی هەر نەبووبن، خۆ ئەم تەعزێیە بیری خستمەوە، ئەگینا تێم هەڵدابوون.

(( ئەچێتە سەیارەکەوەو ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٧٧١ – ڕ/ د – پارکێک:

(( شەنیا بە تەنها دانیشتووە لەسەر کورسییەک قاچ لەسەر قاچ و بە هەردوو دەستی دەموچاوی گرتووەو سەری شۆڕ کردۆتەوە، بە قژ داپۆشراوە، پاش کەمێک سەر هەڵئەبڕێ، چاوی پڕ گریانە))

**شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوە:**

باشە نا ئامۆ.. خۆم ئەکەم بە قوربانیی بۆ تۆو تۆش بەقسەی ڕەق دامئەگریتەوە؟.. من ویستم بڵێم ئەمە دوا یەکتر بینینمانە، بۆ ئەوەی زۆرم لێ بکەیت بەردەوام بین، چونکە هەموو نهێنی ئەو دارودەستەیەم دا بەتۆ، کەچی هەر زۆر بێباکانە هێشتا تۆ خۆت بەوە ئەزانی فێڵی لێکرابێ، ئەی من بۆچی هاتبووم؟ هەموو شتێکم پێنەوتی؟ بەڵام شەرتە بەسەرتەوە نەچێ.. تۆ بڵێی ئەم وڵاتە جێهێڵی؟ شەرتە لە کونی هەتیتەشا بی بتدۆزمەوە.. خۆ من تا ئێستا خۆم لەکاری خراپ ئەپاراست، بەڵام شەنیا نەبم ئەگەر هەموو شتێ نەکەم بۆ تۆڵە کردنەوەم.. دە تۆ ئەگەر پیاوی ژن بێنە، بزانە چۆن وەک ئاگر بەرئەبمە هەناوت؟! هەرچی ڕوویدا ئامۆ ئیتر گوناحی تۆیە، من دڵم هەڵگرتبوو نەیدەم بە کەس، بەڵام تۆ فڕانت و ئاواشت بەسەر هێنام.. دڵنیابە ئەمەت بۆ ئەخەمە پاروویەکی چەورەوە.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( بە کلێنس چاوی ئەسڕێ و ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٧٧٢ – ڕ/ د – ناو سەیارەی خدر٣:

(( خدر٣ قسە بۆ دوانەکەی دواوە ئەکا ))

خدر٣: گرتنی پاشاکە ئەو سیانەتانن، با خۆم دڵنیا ببمەوە کامیان پاشاکەیە ئەوسا هەروەکو ئاگادارکردنەوەکەی ئەوانیتریش ئەڵێم بارەکەڵڵا.. کە سەرزمانم نەگرت و ئەوەم وت، پاشاکە دەسگیر ئەکەین.

چەکدار: یەعنی قوربان جەنابت سەرەتا سەرزمان ئەگریت و دواتر وەک ئێستا ئاسایی ئەبیتەوە؟

خدر٣: با قسەیەک دوو سێ جار نەیڵێمەوە.. بەڵێ بە ڕوونیی پێموتن.

شۆفێر: جا خۆ ڕەنگە خۆی دەرنەخا، هەر چەکل و پەکل بنێرێ.

خدر٣: خۆم زوو لەوە تێ ئەگەم خەمتان نەبێ.

ئەوانی دواوە: بەسەرچاو.

خدر٣: ئاگادار بن ئیتر وا نزیک کەوتینەوە.

Cut

دیمەنی – ٧٧٣ – ڕ/ن – پیشانگەی مۆبایل:

(( ڕێژوان و سەلوا ))

ڕێژوان: لەگەڵیانا بچین؟ هههههە.. بۆ؟

سەلوا: گاڵتەت پێ نەیەت، ئەڵێم کێ ناڵێ لەوێ چارەسەرێک نییە؟

ڕێژوان: بەساقەوبم، ئێستا من کێشەم نییە تۆ کردووتە بە کێشە؟ ئەگەر هەر زۆر حەزت لێیەتی، ئەچین مناڵێکی جوانکیلە هەڵئەگرینەوەو دڵنیام بەختەوەرمان ئەکا.

سەلوا: ئەی خۆ خۆمان جارێ مناڵین، ئەها دکتۆرەکە وتی ئەگەرێک هەیە؟!

ڕێژوان: دەی کەواتە با چاوەڕێ بکەین، پەلەت چییە ماڵم ئاوا کردی؟ ئەڵێی جۆرە مۆبایلێکمان لێ بڕاوە هههههە.

سەلوا: یەعنی ئەوەنەی بەتەنگ بڕانی مۆبایلەوەی، ئەوەنە بەتەنگ مناڵەوە نیت؟

ڕێژوان: نا ئەسڵەن!!!!

سەلوا: دە کەواتە بڕۆ دەرزەنێ سامسۆنگی ٧ بێنە. هههە.

ڕێژوان: ئەمەیان تەواوە! هههههە.

(( ڕۆشتنی ڕێژوان و خەندەی سەلوا ))

Cut

دیمەنی – ٧٧٤ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی گێلاس:

Mute

(( ڕاماڵ پاڵیداوە بە درەخت یان عەمودێکەوە.. ئەڕوانێتە ئۆفیسی گێلاس.. پاش کەمێک تیرۆژ دێتە دەرەوەو سەرنجی ڕاماڵ نادا.. بەڵام ڕاماڵ تەواو لێی ئەڕوانێ تا تیرۆژ ئەچێتە ئوتێلەکەوە.. ئەوەستێ و چاوەڕوانی ئەکات و تیرۆژ لە ئوتێلەکە دێتەوە دەرەوەو بەرەو ئۆفیس ئەگەڕێتەوە، سەری شۆڕ کردۆتەوە بەسەر چەند کاغەزێکداو دووبارە سەرنجی ڕاماڵ نادا))

Cut

دیمەنی – ٧٧٥ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان بە عەرەبانەکەیەوە دێت و دائەنیشێت و دەست بە پشتیەوە ئەگرێ وەک ئەوەی زۆر ماندوو بێت))

ئەردەڵان: ئا قوزەڵقورتێکی دیژم بدەرێ.

هاوڕێ: هەر تۆو قوزەڵقورت؟ بەسەر هەردوو چاوم.

ئەردەڵان: هەر مردم مردم.. بەقەدەر لۆرییەکیان پێ بارکردم و پێیان داگرتمەوە.

هاوڕێ: جا ئەوە خراپە؟ بووی بە محەی ڕەحمەتیی!

ئەردەڵان: من ناشوکر نیم هاوڕێ گیان.. بەڵام ئێرە بە جێی حەوانەوەو دەردەدڵ ئەزانم، توخوا بهێڵە بەدڵی خۆم بۆڵەبۆڵت بەسەرا بکەم.

هاوڕێ: بۆ من بەچی ئەزانی خەپەگیان؟ من هەموو تۆم لەبەرە بەقوربان، توخوا تۆش بۆڵە بۆڵی تازە بکە، هەمان قەوان لێمەدەرەوە بۆ من، با هیچ نەبێ گوێت لێ بگرم.

ئەردەڵان: تۆ گازەرای پشت ئەزانی چییە؟ گازەرا؟

هاوڕێ: لای قاچەوە نییە؟

ئەردەڵان: یەک تۆز ئەولاترە، لای گۆڕی باپیرەتەوە.

هاوڕێ: ئێ ئێ ڕێک ئەزانم کوێیە، ڕێک بەرامبەر گۆڕی مردووت.. هەتیو تۆ کەی ئاقڵ ئەبی؟ بۆ ناوی مردوانم ئەهینیتە ناو باسەوە، من قەت هەڵەیەکم بەرامبەر کردووی؟

ئەردەڵان: ئێ من ئەمەوێ قسەی تازەت بۆ بکەم، تۆ گاڵتەم پێ ئەکەی.. ئەی نەتوت شتی تازە بڵێ؟

هاوڕێ: جا ئەوە کەی تازە بوو؟ گازەرای پشتت خەریکە شەق بەرێ، هەموو ڕۆژێ دەجار ئەیڵێیتەوە.

ئەردەڵان: نەوەڵا ویستم بڵێم گازەرای پشتم عەیبی نییە، هەر شان و باڵم ێشێ هههە.

هاوڕێ: وەی زەهری مار ئەوە بە من پێ ئەکەنی.. دوو سەعات چا نییە، ئەوەش سزاکەت دوو سێ ڕۆژە سزام نەداوی هار بوویت.

ئەردەڵان: نا توخوا ئەوەم لەگەڵا مەکە هاوڕێ گیان.. تۆبە.. بەڵێنت ئەدەمێ قەت پێت پێنەکەنم.

هاوڕێ(( خۆی تووڕە نیشان ئەدا)): نییە، بڕۆ دوو سەعاتی تر وەرەوە.

Cut

دیمەنی – ٧٧٦ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی گێلاس:

(( گێلاس بەرەو دەرەوە ئەچێت و نینا لەدوایەوە، کەمێک هێمنترە، بەڵام بێ ماکیاژ.. هەردووکیان ڕەشپۆش))

نینا: ڕۆڤان بنێرم چی بێنێ بۆ نیوەڕۆ؟

گێلاس: عەزێتی مەدە، پەتاتەی لێیە، هەر پەتاتەو برنجێ لێ بنێ و دوو بەشە گۆشتیش دەربێنە، با لەسەر برنجەکە بێ، دیارو ڕۆڤان وا حەزیان لێیەتی.

نینا: وەڵا گۆشت دەرناهێنم، بوو بەچی هەموو ڕۆژێ گۆشت؟ خراپە باش نییە پورێ.

گێلاس(( سوعبەت)): وەڵا دەری نەهێنی تیتک بە سەرتەوە ناهێڵم هههە. ئەبێ بەشی حەوت کەسیش بکا، ئەوە بە دووبەش دەرئەچێ.

نینا: باشە بۆ حەوت؟

گێلاس: ئەی بەشی دیارو ئەو کچەش ئەبەم بۆ ئوتێلەکە با لەوێ بیخۆن، نەچنە ڕیستۆرانتەکە، خۆشمان چوارو ئەویتریش بۆ یەکێک نەک پەیا بێ.

نینا(( خەندەیەکی کز)): ماشەڵڵا لەو دەستودڵەت.

گێلاس: ماشەڵڵا لە ئازیزت.. ئەوە بۆ تۆش نایەی لەگەڵماو خواردنەکە نەکەی؟

نینا: نا پورێ گیان تکایە.. وەسێتی باوکم ناشکێنم، من نایەمە دەرەوە.

گێلاس: دەی جارێ با بەدڵی خۆت بێ.

نینا: بەخوا جارێ و دواتری تیا نییە، هەتا هەتایە ناچمە دەرەوە.

گێلاس: ئێ چیم وتووە؟ وتم باش، خۆ خراپم نەوتووە؟

(( گێلاس ئەڕوات و نیناش ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٧٧ – ڕ/ د – دۆڵێک:

(( خدر٣ و چەکدارەکانی بڵاو بوونەتەوە، هەموو جامانەیان بەسەرەوەیە.. هەموو چەکی ئۆتۆماتیکی جگە لە خدر٣ تەنها دەمانچەیەک، ئەوانیتریش هەندێکیان دەمانچەو نارنجۆکیان پێیە، سیانیان نزیکی خدر٣ن.. خدر٣ بە دەوری خۆیدا ئەخولێتەوەو بانگ ئەکا، دەشتاییەکیش لە بەردەمیانایە، ٣ سەیارەکەیان لێ ڕاگرتووە))

خدر٣: پاشا هۆ پاشا!!!! پاشای سەگباب خۆت نیشاندە من سمکۆم. (( بۆ چەکدارەکان)) بە خوا وابزانم ئەم سەگزۆڵە کڵاوی کردە سەرمان، دەنگی نییە.

چەکدارێک: کاک سمکۆ با کەمێک بوەستین نەک ئەوان نەگەیشتبن.

خدر٣: کاکە ئەگەر نیازی هاتنیان هەبووایە، لە شەبەقییەوە بۆسەیان بۆ دائەناین، سوور ئەیانزانی بێ چەک نایەین.

چەکدار: ڕاستە.

خدر٣(( هاوار کردن)): هۆ پاشای سەگباب ئەگەر خۆت دەرناخەی ئێمە بەدیار تۆوە دەسخەڕۆ نابین ئەڕۆین.. بەڵام ئەمەت بەسەرەوە ناچێ، شەرتبێ یەک شەقی وات تێسرەوێنم، بۆ کوڕی کوڕتی بگێڕیتەوە.. ئەوە من ڕۆشتم ترسنۆکی خوێڕی.. (( بۆ جەماعەت)) دەی کاکە بۆ سەیارەکانتان، بابڕۆینەوە.

(( هەموو ئەگەڕێنەوەو ئەچنە سەیارەکانەوەو ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٧٧٨ – ڕ/ ن – زیندان:

(( حەمە تایەرو پارێزەرەکەی دانیشتوون))

تایەر: شتێکم بۆ بکە بەساقەوبم، بەخوا باوکم زۆر تەنیابالّە کەسی نییە، خۆت ئەزانی هەر خۆی و پیرێژنەکەی دایکمن.

پارێزەر: باوەڕ بکە هەرچی لە توانامدا بوو کردم.. ئەوە ساغ بووەوە کە بە فیشەکی دەمانچەی تۆ نەکوژراوەو جگە لەوەی فیشەکەکە ٩ ملیمەو ئەوی تۆ ٧ ملیمە سەبەتانەی دەمانچەکەشت ئەوەی سەلماند، پاک دەرچوو. بەلاّم کوڕی باش هەلّەکەت ئەوەیە بە بێ پرسیار کردنیش نیەتی تاوانکردنەکەت ئاشکرایە.

تایەر: ئەوە ڕاستە بەس خۆ من نەمکوشت.. تۆ ئەبووایە ئازادت بکردمایە، وەلاّهی مانگێک زیندانیکردنیش بۆ ئەو ئیشەی من زۆرە.

پارێزەر: داواکاری گشتیی داوای لەسەرت هەیە، ئەوەندە ئەزانم، کاتێ کە چوویتە سەری، ئەگەر پێش تۆ نەکوژرایە تۆ ئەتکوشت، کەواتە شتێک بوو بە بەربەستی ئەوەی تۆ نەیکوژی، ئەویش ئەوە بوو کە کوژراوە،

تایەر: کەواتە هەمووشیان ئەزانن هیچ گوناهێکم نییە.

پارێزەر: نا برا گیان وانییە.. لەم حالّەتەدا ئەوەی تۆ شروعە، ئەزانی ڕێک وەک ئەوە وایە تۆ کوشتبێتت، بەلاّم بۆت هەلّنەکەوتووە؟ ئەوەش بزانە دەرکەوتایە تۆ کوشتووتە، سزاکەت لە سێدارەدان یان تا هەتایی ئەبوو بەلانی کەمەوە..

تایەر: ئەک مالّت ئاوا بێ یاخوا.. یەعنی براکەی من ئاوی لەبەر ڕۆیی؟ کاکە ئەویش خوێنی لەبەر ڕژا، ئەوە تۆ باسی چیم بۆ ئەکەی؟

پارێزەر: ئەوەیان شتێکیترە کاک حمە تایەر، ئەتتوانی پۆلیسی لێ ئاگادار بکەیتەوە.. بەلاّم ئێستاش من توانیم ئەوەت بۆ بکەم و لە مردن بتگێڕمەوە کاک حەمە تایەر، هیچ نەبێ ئێستا دایک و باوکەکەت ئەتوانن حەفتانە بێن و یەکتر ببینن.. ئیتر هەر

ئەوەمان لە دەست دێت، ئێمە تەنها ڕوونکردنەوەمان لەسەرە خۆ بۆ هیچ کەسێک نییە یاسا بگۆڕێ، ئیتر یاساکە ئاوایە.

(( لە میوتیدا دیالۆگ و چوونە دەرەوەی پارێزەرو پۆلیسیش تایەر ئەبەن))

Cut

دیمەنی – ٧٧٩ – ش/د – باخی ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس و ئاکۆو نیناو نارەوەن و تیرۆژ دانیشتوون))

نارەوەن: جا ئەوە چییە گێلاس خان گیان؟ بەخوا حەز ئەکەم سێ ژەمە خواردنتان بۆ بێنمە ئەمبەرەوە.

گێلاس: یاخوا ماڵتان ئاوا بێ، تۆ ئەزانی ئەم ئێوارەیە چیت کرد؟ بەشی گەڕەکێک خواردنت ناردووە، ئاخر ناخورێ چی لێ بکەین، یاخوا دەستت خۆش بێ، زۆر بە تام و چێژیش لێتنابوو.

تیرۆژ: نەڵێم دایکی خۆمە، خواردنی دەستی زۆر خۆشە.

نارەوەن: خۆشی چی؟ ئەوە بە پەلە لێمنا وتم با فریایخەم، ئەگینا بۆ جارێکتر هەر زۆر جوانتریش دەری ئەکەین.

نینا: خوا نەیبڕێ، نارەوەن خان، ئەرکتان کێشا زۆر سوپاس.

گێلاس: ئەمجارەیان سەرەی خۆمەو پێکەوە ئەیخۆین، بزانین تیرۆژ بە چێشتی من ئەڵێ چی؟

نارەوەن: بۆ کەمی خواردووە؟ باوەڕ بکە دایم وەسفی خواردنت ئەکا.. ئەی توخوا گێلاس خان نانتان ناوێ؟ من ئەو ژنە نانی تیریم بۆ ئەکاو بەدەمیەوە بازاڕییەکەش ئەکڕین، با بیهێنم بۆتان.

گێلاس: نەبەخوا نارەوەن خان ماڵتان ئاوا بێ یاڕەبی.. کاکە ڕۆڤانی (( دەست بۆ نینا ڕائەکێشێ)) برای، هەموو بەیانییەک یەک باوەش نانی گەرم لە نانەواخانەکەی ئەوبەری جادەوە ئەهێنێ، بەشی هەر سێ ژەمەکە ئەکاو زیادیشی هەیە، توخوا ئەگەر ئێوە ئەتانەوێ با بیهێنم، خۆ ئەم ئێوارەیە کارێکت کردبوو، کەس نانی پێوە نەخوارد.

نارەوەن: یاخوا هەموو شتێکتان زۆربێ، دەردو بەڵا نەبێ، عافێتتان بێ هیچم نەکردووە.

دیمەنی – ٧٨٠ – ش/ د – شوێنی نیمچە تاریک:

(( میری گەورە لە شوێنێکی نیمچە تاریکدا لە دەرەوە بە مۆبایل تێل ئەکا ))

میر: پاشا لەسەر ملهوڕی خۆت بەردەوام نەبی وریابە، من ڕەحم بە دایک و باوکی خۆشم ناکەم، ئینجا تۆ.

پاشا (( دەنگ )): میری گەورەم من خزمەتکاری تۆم، هەرچی ئەفەرمووی ئەوە ئەکەم، بەڵێ تەنها یەک کارم بێ پرسی جەنابت کردووە، بە گەورەیی و دڵفراوانیت بمبەخشە، هەرگیز دووبارە نابێتەوە.

میر: ئەمتوانی یەکسەر سزاکەت بدەم، بەڵام ئەمجارە گوێم نەدایە بۆ ئەوەی دڵنیا بیت، ئاگام لە هەموو شتێکتەو بە ملهوڕیی خۆم و لەسەر وەسێتی کاک دارەوان بوو تۆم دانا چونکە بەڵێنی ئەوەی پێدابوویت.. نامەوێ دووبارەی بکەیتەوە.. تۆ تەنها فەرمان جێبەجێ ئەکەی، نەک فەرمان دەربکەی بۆ خوارووی خۆت.. بەردەوام پارەی خۆت بە زیادەوە وەرگرتووە.

پاشا: فەرمانتە میری گەورەم.

میر: سمکۆم بۆ چارەسەر بکەو لە ئیشە گەورەکەیا دەستبەکاریکە.. ئەمڕۆ دەرکەوت پۆلیسی لە پشت نییە، لێی بێخەمبە.. ناوی کچی ماڵی کاک دارەوانیش بەری، هەردوو چاوت دەردێنم، ئەوان ئامانەتن لە ئەستۆی ئێمەدا.

پاشا: فەرمانتە میری گەورەم.. ئەی هیچ پلانێکت هەیە بۆ دەستبەکاربوونی سمکۆ؟

میر: بەپێی بارودۆخ، خۆت لە بەیانییەوە نەخشەیەک دابنێ بۆ بینینی و با دەست پێ بکەین، هەموو دەزگاکانی دەوڵەت ئێستا خەوتوون، پێیان وایە دوای لە سێدارەدانی پاشای گەورە، کەس ناچێتەوە سەر ئەو بازرگانییە.. ئێستا کاتیەتی و دەست و برد بکە.

(( مۆبایل ئەخاتەوە ژێر تایەی سەیارەکەی ))

Cut

دیمەنی – ٧٨١ – ڕ- بەیانیی زوو- ن – ماڵی گێلاس:

(( ڕۆڤان لەسەر سیسەمی دیار خەوتووەو ڕۆڤان لەسەر زەوی سەرچەفێکی بەسەرەوەیە.. زەنگی ئاگادارکردنەوەی نینا لێ ئەدات و زوو خەبەری ئەبێتەوە.. سەرچەفەکە لەسەر ڕۆڤان لائەبات))

نینا: ڕۆڤان! ڕۆڤان گیان.. کاکە.. دەی هەستە بەقوربان، بچۆ بۆ نانەکە درەنگە کاکە گیان.. ڕۆڤان!... (( بە دەنگی بەرزتر)) دە هەستە ڕۆڤان گیان، درەنگە بچۆ نانەکە بێنە، با نان و ماستەکە بۆ کاک ئاکۆو پورێ ئامادەکەم.. دە هەستە باوانم.

ڕۆڤان: توخوا پێنج دەقەیتر نینا گیان، با تۆزێکتر با بخەوم.

نینا: ئاخر ئەوانیش خەبەریان ئەبێتەوەو ئەبێ نانی ساردیان بدەمێ، خێرا بچۆ با بە گەرمیی بیخۆن.

ڕۆڤان(( بەدەم هەستانەوە)): ئۆف خوایە ناهێڵی تۆزێ بخەوم.. کەی ئەچینە ماڵی خۆمانەوە لە کۆڵ نان کڕینی بەیانیان ببمەوە؟

نینا: دە عەیبە درەنگە براکەم، ئیشەڵڵا زوو خانوویەک ئەدۆزینەوەو ئیتر هەر خۆم ئەیکڕم، چۆن دڵم دێ تۆ بنێرم.

ڕۆڤان(( هەر بەو جلانەوە)): توخوا تۆزێ پەلەکە نینا گیان، بەخوا زۆر بێزارم.

نینا: بەڵێنت ئەدەمێ زوو ئەوە بکەم بەقوربان، تۆ ئێستا بڕۆ با درەنگ نەکەوی.

ڕۆڤان: ئەگەر باوکم ئاگای لەم حاڵەم بووایە، نەیئەهێشت یەک شەو لە ماڵان ڕۆژ بکەینەوە.

نینا: ئیتر بەدبەختیی ئێمە ئەو نەما، دەسەڵاتمان چییە؟

Cut

دیمەنی – ٧٨٢ – ڕ/ن – ماڵی دڵنیا:

(( دڵنیا کەمێک بە گرژیی ئارەزوو هەڵئەسێنێ، هەردووکیان لە ژوورێکا لەسەر زەوی نوستوون..))

دڵنیا: هەستە ئارەزوو دەی بچۆ نانەکە بێنە.

ئارەزوو(( ڕائەپەڕێ و قیت ئەبێتەوە)): ئەزانی نیوەشەویش بڵێی بچۆ نان بێنە، لە ترسی کاکە چۆن ڕائەپەڕم؟

دڵنیا: ئای!!! کە ژنیشی هێنا ئەوسا هەموو بەیانییەک بە سەعات خۆی خەبەر ئەکاتەوە، ئەیچۆن؟ خانمەکەی ئەبێ نانی گەرم بخوا.

ئارەزوو: دە من هەقم چییە بەسەریەوە، گرنگ ئەوەیە ئەو بەیانیان نانە گەرمەکەی بخوا، نەک من شەقە گەرمەکان بخۆم.. بێنە پارەم بەرێ.

دڵنیا: بچۆ لە دایکمی وەرگرە من پێم نییە.

(( ئارەزوو هەر بە جلی ماڵەوە ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٨٣ – ڕ/ د – نانەواخانە:

(( ڕۆڤار وەستاوەو چاو ئەگێڕێ بۆ کۆڵانێک یان شوێنێک، کە ئارەزوو لەوێوە دەرئەکەوێ.. ڕۆڤان تەماشای ئەکا تا ئەگاتە نانەواخانەکە.. ئارەزوو گرژو مۆن خۆی نیشان ئەدا، پارەکەی دائەنێ لە ژێر شیشێکدا کە بۆ سەرە دانراوە، دوای پارەی ڕۆڤان))

ئارەزوو(( مۆن)): هەشت نان.

ڕۆڤان: ئەگەر پەلەتە بیخەرە پێش ئەوەی منەوە.

ئارەزوو(( مۆڕەی لێ ئەکات و هیچ ناڵێ))

(( نانەوا باوەشێک نان بۆ ڕۆڤان ڕائەگرێ و پێی ئەڵێ ها کاکە.. ڕۆڤان ئەڕوات و یەک دووجار ئاوڕی دواوە ئەداتەوە بۆ ئارەزوو))

———— تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٧٨٤ – متبوع – ڕ/د – شەقامێکی فەرعیی:

(( ڕۆڤان لە نانەواخانە دێتەوەو باوەشێک نانی بەدەستەوەیە، لە شەقامەکە ئەپەڕێتەوەو سەیارەیەک دەرئەکەوێت بە خێرایی دێت و ڕۆڤان ئەشلەژێ..

# (( ئەڵقەی سی و هەشت))

سەیارەکە لێی ئەدات و نان پەرش و بڵاو ئەبێتەوە.. خەڵک کۆ ئەبنەوەو ڕۆڤان مردووە.. شۆفێرەکە دائەبەزێت و ئەدا بەسەری خۆیدا.. هەر یەکەو قسەیەک ئەکا، یەکێک تەلەفون بۆ ئیسعاف ئەکا، یەکێک دێت دەست لە ژێر ملی ئەدات و دواتر دەستی وەک شارەزا بێت))

کەسەکە: بە داخەوە، ڕوحی تیا نەماوە.

(( بە دەم لورەی ئیسعاف و قسەی خەڵکەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٨٥ – ڕ/ د – عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر لەسەر تەپڵەکێکی تەختە لەبەردەم عەرەبانەکەی دانیشتووە، هەر خزمانی بە جلی کوردییەوە لەو دەوروبەرەن، تەلە فونی بۆ دێت تەماشای ئەکات و زۆر تووڕە ئەبێت))

خدر٣: ١- ئەوە هەی بەدڕەوشتی هیچ و پووچ بۆ دوێنێ ئەو کەتنەت پێدام و نەهاتی؟ وا ئەزانی بەسەرتەوە ئەچێ بەمن ڕابوێری؟ کورە هەی تەرەس من ئەهلی ئەو گاڵتەوگەپە نیم، وامەزانە هەرچیت بوێ بۆت ئەچێتە سەر، من سمکۆی باوەفاخری سەرتەلاشم پێ ئەڵێن، وامەزانە هەروا بە ئاسانیی کڵاو بکرێتە سەرم.......... ٢- ئینجا ئەڵێی ترساوم؟ بیللاهی تۆ نەک پاشا خەدەم و حەشەمیش نیت.. عەیب ناکەی پیاو چۆن ئەترسێ؟.. ئەی من پێم نەوتی لە هەردوو حاڵەتەکەدا ٥٠ کەسیش بێنم کەمە؟ ئێ خۆ پەنجام نەهێنا بوو هەی کەللەپووت!............ ٣- کورە ئەوە تۆ فێڵ لە کێ ئەکەی ناپیاو؟ ئەی پێویستیی بە ناوشاخ و داخ چی بوو؟ ............... ٤- من هیچ ئیشم بە ئێوە نییەو خەتای خۆم بوو وەڵامی تەلەفونم دایەوە، هەر ویستم تۆزێکت بۆ بنێرم و پێت بکەم.. ئەگینا تۆ پیاوی ناو پیاوان نیت.

(( مۆبایلەکەی دائەخاتەوە.. دووجار پاشا زەنگ ئەکاتەوەو جاری دووەم هەڵیئەگرێ))

خدر٣: ١- هیچ تێ مەتوڕێنە، من ئیشم بە تۆ نییەو ئەسڵەن نامەوێ هەرزەی وەک تۆ هەر بناسم.. ئەوەی لە چاوی تۆوە دەستم ئەکەوێ گووم تێکرد، باشە؟ دەبەسەو سەر مەکە سەرم............. ٢- پارەم ناوێ، بەڵام بۆ دانیشتن، ئەبێ لە دوکانەکەی خۆما دانیشین، هیچ شوێنێکیترم قبوڵ نییە، ئەوە سزاکەتە باشە؟.......... ٣- ئێستا با مۆبایلەکەت بەسەرا دانەخەمەوەو وەک تۆ نەیکوژێنمەوە.. ئەوەی وتم هەر ئەوەیە، قسەی من ڕەتکردنەوەی نییە، تێگەیشتی؟، ئەگەر نایەت هیچ، من ئیشم بە تۆ

دیمەنی – ٧٨٦ – ڕ/ ن – ژووری پاشا:

(( پاشا چروتێکی بەدەستەوەیەو تێل ئەکا))

پاشا: ١- بوەستە شێتی بێهۆش، کڵاوی چی و تەڕەماشی چی؟ من لەوێ بووم، بەڵام تۆ سوپایەکت بۆ هێنابووم ئەتوت بۆ شەڕی داعش ئەچن، هەر دەبابەتان پێ نەبوو، بۆیە نەموێرا دابەزمە خوارەوە.. ئەرێ ئەوە ئاربیجی و میلانتان بۆ نەهێنابوو؟............... ٢- جا بۆ یەکجاری خزمانی ئەملاولاشت کۆنەکردەوە ها؟ . باپێت بڵێم ڕێککەوتن ئاوا ناکرێ، نە تۆ پێویستیت بەو سوپایەیەو نەمن............. ٣- بەهەرحاڵ.. ئێستا با شوێنێکیتر دانێین بۆ یەکتر بینین، ئەوەی تۆ ئەیکەی ناکرێ.......... کورە تۆ .......

پاشا: ئای خوا جا ئەمە کەرە.. ئەگەر میر نەئەبوو، توخوا ئەمە پیاوی ئەوە بوو هەر تفیشی تێکەم؟ کورە نەبەخوا.

(( پاشا دووجار تەلەفونی بۆ ئەکاتەوەو دووەمجار خدر٣ هەڵیئەگرێ))

پاشا: ١- کوڕی باوکم ئەوە بۆ ئەوەنە دەمارگیری؟ تۆ جارێ بوەستە بزانە من ئەڵێم چی؟ ......... ٢- کاکە سمکۆ گیان تۆ کەمێک هێور بەرەوە، بزانە ئەڵێم چی، باوکم تۆ هەرچییەکت پێ باشە ئەمجارە وا ئەکەین، حەزت لە هەر شوێنێکە لەوێ دائەنیشین و لە هەقی ئەو ماندوو بوونەی دوێنێشتا سزایەکی ماددیی باشم بدە، باشە براکەم؟............... ٣- کورە کاکە سمکۆ شتی وا نەشیاوە، من چۆن بێمە بەرچاوی خەڵک و بەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەوە، ڕێککەوتنت لەگەڵا بکەم بۆ شتی قاچاخ و مەترسیدار؟.. کاکە با ماڵەکەی خۆت بێ دێم بۆ ئەوێ......... ٤- ئەزانم قسەت گەڕانەوەی نییە، بەڵام بەخوا ئەو شوێنەش بۆ من دەست نادا، هەر لێیگەڕێ باشترە ..............

(( ئای خوایە! جا وەرە ئەم کەرە تێگەیەنە، سوور ئەزانم ئەرز با لە ئاسمان، گەر سەریشی

نییە، تۆ ئیشت بە منە، وەرە دوکانەکەم و قسەی خۆمان ئەکەین و ناشیەی جار بە جەهەنەم ......... ٤- ئەوەیان کەیفی خۆتە، خۆ من داوام نەکردووی بتبینم.

(( مۆبایل دائەخاتەوە.. پێکەنینێک، دواتر دووبارە پاشا زەنگی بۆ ئەکاتەوەو هەڵیئەگرێ))

خدر٣: ١- ئەرێ کاکە بهێڵە کەسابەتەکەم بکەم، ئەم هەموو ڕینگە ڕینگەت لەچییە مێشکت بردم ............ ٢- شتی وا نییە.. ئێرە یەعنی ئێرە، ئەگەر ئیشت پێم بوو وەرە بۆلام، دەی مشتەری هات کەڵکی قسەم نەما.

((مۆبایل دائەخاتەوە))

Cut

دانابێ لە قسەکەی پاشگەز نابێتەوە.. باشە ئاخر چۆن ئەکرێ من بچمە دوکانی ئەو؟ مەگەر ڕایگرم تا پرس بە میر ئەکەم، ئەی چی بکەم؟

(( زەنگی بۆ ئەکاتەوە))

پاشا: ١- براکەم چەند ڕۆژێک لەسەرم بوەستە با بیرێکی لێ بکەمەوە.. بابە هەرچییەکت ئەوێ لەسەر سەرم، بەس تکات لێ ئەکەم ئەوێ نەبێ، ئیتر هەر شوێنێک بێ لە خزمەتتام...............

پاشا (( لەبەرخۆیەوە)): کورە ئەم سەگی سەگبابە زۆر بێ منەتە! ئێ وایە عەرەبانەی خۆی ئەگێڕێ و چ کاری بەم سەرێشەیەیە؟

Cut

دیمەنی – ٧٨٧ – ڕ/ د – بەردەمی طب عدلي:

(( ئاواو سەردارو ئاکۆو دیارو ئامۆو مامەحمەو مامەیاسین و زوبێرو بروسک و ئەگەر بکرێ چەند پیاوێکیتر وەستابن، دواتریش هەندرێن دێت، مەیت وەرئەگیرێتەوەو ئەخرێتە سەیارەیەکی پیکابییەوەو بەرەو ماڵەوە))

زوبێر(( بە دەنگی نزم)): ئەوە ڕێژوان کوا؟

بروسک: دوکان ئەکاتەوە تا سەلوا ئەچێت و ئەوسا خۆی دێت.

(( زوبێر سەر ئەلەقێنێ، بە مانای ئەوەی تێگەیشت))

ئامۆ: کاک ئاکۆ با بەر ماڵەوەی تیا نەبێ، بۆ ئەو ژنانە زۆر زەحمەتە.

ئاکۆ: ناکرێ کاکە ئامۆ، ئەوانیش ئەبێ بۆ دواجار بیبینن و نەریتی خۆشمان هەروایە کاکە.

ئاوا: جارێ بۆ گێلاس خان و ئەو خوشکەی هەر زۆر زەحمەتە، دوو کۆستی ئاوا گەورە بەسەریەکەوە.. تۆ هەولبە پرسی مامۆستای مزگەوتەکە بکە، بەڵکو ڕاستەوخۆ بچین بۆ مزگەوت.

مامەیاسین: ئەوە نەکراوەو قەت نابێ نەچینەوە بەر ماڵەوە.

ئاکۆ: باشە مامەیاسین، ئەچینە بەرماڵەوە، بەڵام کەم ئەمێنینەوە، زوو ئەیگەیەنینە مزگەوت و بشۆرێ.

ئاوا: دە خێرا با بڕۆین.

______ تابع ______ Cut ______

دیمەنی – ٧٨٨ – متبوع – ڕ/ د – شەقامی گشتی:

Mute

(( جەنازەکە بەسەر پیکابەکەوەو سەیارەی ئامۆو ئاواو سەرداروو زوبێرو ئەگەر سەیارەیتریش هەبێ بە دوایانەوە، بەرەو ماڵ ئەچن))

———— ربط ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٧٨٩ – ڕ/ د – پیشانگەی مۆبایلی ڕێژوان:

(( دڵنیا لە ژوورەوەیە، چاو بۆ مۆبایل ئەگێڕێ، ڕێژوان سەرنجی لەسەری نییە.. دڵنیا بە نازەوە هەوڵ ئەدا سەرنجی ڕابکێشێ))

دڵنیا: ئەو ئایفۆنە بە چەندە؟

ڕێژوان: ئەوە گرانە، بایی ٩٠٠ دۆلارە.

دڵنیا: واو!!

ڕێژوان: ئەی وایە مۆدێلی بەرزە.

دڵنیا: ڕاست ئەکەی.. ئەی سامسۆنگی حەوتم نەبینی.

ڕێژوان: بارێکی تازەمان بۆ دێت، لەوەیا تیایەتی، ئەگەر سەر بدەیتەوە.

دڵنیا: ڕاستیەکەی ناتوانم ئەوەندە بێمە بازاڕ.. خۆت کچ ناتوانێ ڕۆژانە بازاڕ بکا؟

ڕێژوان: ئەگەر زۆرت مەبەستەو پەلەتە، سەرسوچەکە دوکانێکی لێیە، ئەوان هەیانە.

دڵنیا: واو چەند سەرنجت ڕاکێشام بەو چارەسەرە خێرایە.. بەڕاستی من کەسی وام لا گرنگە.

ڕێژوان: زۆر سوپاس، ئەی خۆ ئەبێ چارەسەرێکت بکەم هەهە.

دڵنیا: مادام وای لێهات، من بۆ ئیشی مۆبایل، تەنها دێمە لای خۆت.. من چارەسەرێکیتریشم لایە.

ڕێژوان: ئێهـ ئەوەیان هەر زۆر باشتر.

دڵنیا: من فەیسبوکی خۆمت ئەدەمێ، بە ماسنجەر ئاگادارم بکەرەوە، ئەوە چۆنە؟

ڕێژوان: ئەگەر بەلای تۆوە ئاسایی بێت، بۆ نا؟

دڵنیا(( وەک تحذیر کردن)): بەڵام نەکەی زەنگم بۆ بکەی.. ماڵی ئێمە قەرەباڵغەو توشی گرفت ئەبین.

ڕێژوان: نا نا زەنگت بۆ ناکەم، هەر بە نامە.

دڵنیا: سوپاس بۆ تێگەیشتنت.

ڕێژوان: سوپاس بۆ تۆش.. ئادەی ناوەکەت؟

دڵنیا: زۆر ئاسانە.. D سپەیس، Inya9 .

ڕێژوان(( بە مۆبایل خەریکە)): زیرەکانەیە، هەر یەک ناوی وای تیایە.. بەڵام وێنەی پرۆفایلەکە خۆت نیت؟

دڵنیا: گەر بووین بە هاوڕێ تێت ئەگەیەنم لەبەرچییە ناتوانم دایبنێم.

ڕێژوان: تۆ هاوڕێی بەڕێزی منیت خوشکە دڵنیا، ئەها ناوت دڵنیایە؟

دڵنیا: بەڵێ ئەی تۆ؟

ڕێژوان: من ڕێژوان (( سەلوا دێتە ژوورەوە)) ئەوەش خانمە نازدارەکەم، ناوی سەلوایە.

(( یەکتر ناسین و بەخێرهاتن))

دڵنیا: جاروبار کە بەبەر دوکانەکەتانا تێئەپەڕم ئەیبینم، ئەموت خوایە ئەو کچە جوانە، چی ئەو کوڕە بێ؟

ڕێژوان: دەی با ئێمە ناشرینەکە بین قەیچێکا.

دڵنیا: ئۆو توخوا ببورە مەبەستم ئەوە نەبوو!

Cut

دیمەنی – ٧٩٠ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی گێلاس:

(( ژنەکان شیوەنی گەرمیانە بەسەر تەرمی ڕۆڤانەوە، پیاوەکان کەمێک دوور وەستاون، نینا بەتانی و دەستی ڕۆڤان ماچ ئەکا کە لە دەرەوەیە.. بروسک لەسەر تەرمەکەیە

ژنەکان: گێلاس، سۆما، نینا، تیرۆژ، نارەوەن، ئەگەر چەند ژن و کچێکیتریش هەبێ))

نینا (( بەقیژەو شیوەن)): توخوا سەری لابەن با ماچیکەم تووووووخوا !!!!

گێلاس(( شیوەن و توڕەبوون)): ئەرێ دەبهێڵە سەری لابا کاکە، برایەتی برا، با بۆ دواجار بیبینێ.

بروسک: نابێ دایکەکەم نابێ، شێواوە شێتی ئەکا.. (( بۆ زوبێر)) مامە خێرا دەرچن بەسیەتی.

زوبێر: دەی کاکە ئەو ژنانە دوورخەنەوە با بڕۆین، خۆیان ئەکوژن ئێستا.

ئاکۆ: دەی بۆ مزگەوت بەقوربانتان بم.

(( مامە حەمەو بروسک و ئامۆو هەندرێن ژنەکان دوور ئەخەنەوەو ئاوا لە دوورەوە ئەچێت بۆ سەیارەکەی و ناچێت بەلای ژنەکانا.. هەموو سەرئەکەون و دەرئەچن))

Cut

دیمەنی – ٧٩١ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان پێکەوە قسە ئەکەن))

هاوڕێ: ئەی تۆ بۆ نایەی؟ لەبەر کاک ئامۆو نارەوەن خان!

ئەردەڵان: ئەرێ تۆ پێم بڵێ هاوڕێ، جارێک ئەو کاک ئامۆو نارەوەن خانە بانگیان کردوومەتە سەر سفرەیەکی ڕازاوە؟ هەر بۆ تەعزێ و تەعزێ، بەڵکو بچم شوێنێک بگرم، هەر باشە.. کورە بۆ ژنهێنان و شووکردنەکەشیان، نوقوڵێکم نادەنێ.. دەی ئەوە ئیتر منیش ناچم بۆ تەعزێیان.

هاوڕێ: کورە وامەکە گێژە، ئەوان لە کوێ لە خۆشییا من و تۆیان لەبیرە؟ من ئەچم و باشیش هەڵئەسوڕێم بۆ ئەوەی نانەکەم مسۆگەر بکەم (( ئەحە بەوێدا ئەڕوا)) ئا ئەحە ئەحە وەرە.

ئەحە: فەرموو کاک هاوڕێ!

هاوڕێ: چاوێکت لە چاخانەکە بێ و خەڵکەکەم بۆ بەڕێکە، ئەچم بۆ سەرقەبران.

ئەحە: کێ ئەمری خوای کردووە؟

هاوڕێ: تۆ نایناسی.

ئەردەڵان: منیش هەر بەقەد ئەوی ئەناسم، ئیتر بۆ من بێم.

هاوڕێ: هەستە خۆت بێ ئەقڵ مەکە، تۆ لەبەرچاوانی.

ئەردەڵان: ئاخر من نانی نیوەڕۆ لەوێ ئەخۆم، چەورە ئێستا.

هاوڕێ: تۆ هەستە جارێ، لەوێ خۆتیان پیاهەڵواسەو بچۆ لەگەڵیانا.

(( پێکەوە ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٧٩٢ – ڕ/ ن – گوندی باوکی خدر:

(( هەرمێ پارەیەکی زۆری بەدەستەوەیە، بۆ باوکی ڕاگرتووە))

هەرمێ: باوکە ئەوە کاکەم ناردویێتی.

باوک(( ئاماژەی ئەوە ئەکا گیرفانی پڕەو پێویستی پێی نییە، هەڵیگرێتەوەو لای خۆی بێ))

هەرمێ: پارەمان ناوێ، منیش زۆرم پێیە.. با بێتەوەو چارەسەرێکی تۆ بکا.. خەریکە منیش پەڕوباڵی بۆ دەرئەکەم، بەخوا زۆر زۆری بیر ئەکەم.

باوک(( نزا ئەکا خوا بیپارێزێ))

هەرمێ: ئامین.. خوای گەورە بیپارێزێ.

(( هەرمێ ئەچێتە ژوورێکەوە پارەکە هەڵگرێ))

Cut

دیمەنی – ٧٩٣ – ڕ/ د – بەردەمی ماڵی نارەوەن و گێلاس:

(( دوو خێمەی پیاوان و ژنان هەڵدراوە.. لە خێمەی ژناندا، گریانی زۆر.. نینا بوراوەتەوە تیرۆژ ئاو ئەپرژێنێ بە دەم و چاویاو گێلاس و نارەوەن بەپەلە ئەجوڵێن بۆ لای.. بەدەم یاللەوە، خوای گەورە هاوارەوە، مەلایەکی ژن کە قورئان ئەخوێنێ، قورئانەکەی ئەپچڕێ و سڵاوات لێ ئەدا-

ئامادەبووان: نینا، گێلاس، نارەوەن، تیرۆژ، سۆما، سەلوا، چیمەن بە سکی زلەوە، چەند کچێکی گەنج و چەند ژنێکی پیر))

گێلاس: نارەوەن خان فریاکەوە بزانە عەترێ ناهێنی؟ !

تیرۆژ: من ئەچم (( بە ڕاکردن بۆ ماڵەوە))

نارەوەن: یاللە، خوایە گیان هیچی بەسەر نەیەت.

مەلا: هیچ نییە زۆر سەغڵەت مەبن، ئاوەکە بپرژێنن بە دەم و چاویاو با عەترەکەش بێنێ، توخوا یەکێ پێی بڵێ با عەترکە تیژ بێ.

گێلاس: ئەگەر نەهاتەوە هۆشی خۆی، بە پیاوەکان بڵێن با یەکێکیان بیفڕێنێ بۆ خەستەخانە.

مەلا: نا پێویست ناکا دایکەکەم.

(( ئاویتر ئەپرژێنن بە سەروچاویاو دێتەوە هۆش خۆی.. کەمێک ئەڕوانێتە خەڵکەکەو باوەش بە گێلاسا ئەکا))

نینا(( بە شیوەنەوە)): ئەرێ پورێ گیان من شین بۆ باوکم بکەم یا ڕۆڤاااااان؟

(( گریانی ئەوەی لە دەوریەتی، مەلا سڵاوات و فاتیحا.. ناچار هەموو بێدەنگ ئەبن و فاتیحا ئەڵێنەوە، مەلا قورئان ئەخوێنێ))

(( ئەگەر لە خێمەی پیاوان ئاوا نیشاندرا، وەک تەعزێکەیتر گەرم و گوڕ نییەو لە شوێنێکدا دانیشتووەو ئاکۆو ئامۆو دیارو مامەحەمەو مامە یاسین و چەند پیاوێکیتر بە پێوەن))

Cut

دیمەنی – ٧٩٤ – ڕ/ د –ماڵی تریفە:

(( تریفە ڕەشپۆشەو لەبەردەرگا وەستاوە، وەک چاوەڕوان بێ.. پاش کەمێک هەڵشۆ پەیا ئەبێ))

هەڵشۆ: ئەرێ ئەوە چیتە دیسان خۆت لە خوم هەڵکێشاوەو مکیاجت نەکردووە؟ ئیشەکەت ئەوەیە بچی بۆ تەعزێ؟

تریفە: ئەی ئەبێ بەخەڵکەوە بین ئەیچۆن؟ تا خەڵکیش پێمانەوەبێ.

هەڵشۆ: جا منت بۆچی بۆ ئەوە بانگ کردووە؟ وەک جاری پێشوو بڕۆشتیتایەو ئەهـ.

تریفە: وەی خوا لەدەست تۆ هەڵشۆ.. جاری پێشوو چیت پێ نەکردم، خۆ هەر خەریک بوو لە گەڕەکا حەیام بەری، ئێستاش وا ئەڵێی؟ ویستم بمبینی کە سەرتاپا ڕەشپۆشم.

هەڵشۆ: هەرچەندە جلی ڕەش باشترین دەرفەتە بۆ بانگکردنەوەی من و پیاسەو گەڕانی خۆت.. بەڵام ئەمجارە بە حساب کێ مردووە؟

تریفە: ئەوە چییە هەڵشۆی ناموبارەک؟ بۆ یەکجاریی ناڵێی بۆلای دۆست ئەچی؟ ئا ئا ئا، خۆ قسە ناکەم خەریکە پێی لێ هەڵبڕێ.

هەڵشۆ: من وامنەوتووە، من پیاسەو گەڕانم وت، تۆ خۆت ئەیبەیتەوە بەلای دۆستا.

تریفە: با یەک شتت پێ بڵێم هەڵشۆ.. من بە بوختانی تۆ لەکەدار نابم و دنیاش ئەزانێ کێ باوک و برامە، چۆن لەکەیەک ئەهێنمە سەر ئەوان لە بەر فەرامۆشکردنم و لە ڕقی دەروونی ڕەشی تۆ؟ شێتیش بی ناتوانی یەک خاڵم لەسەر دروستکەیت، تا لەبەرچاوی کەسوکارما تاوانبارمکەیت.

هەڵشۆ: ئەوە نییەتی دڵی خۆتە، من شتی وام نەوتووە، پێم بڵێ، کێ مردووە؟

کوڕی ئەو پیاوەی ماوەی پێشوو کارەبا لەسەر دەرگاکەیان بوو و کوشتی.

هەڵشۆ: ئەمیان بە چی؟

تریفە: فەقیرە سەیارە لێیداوە.

هەڵشۆ: ماڵی ئەوانیشم ئاواکرد، کەمێ دەست بە تەعزێوە ناگرن.

تریفە(( پەنجەی دۆشاومژەی ئەخاتە سەر دەم و لێوی)): وایییی ئەوە چۆن وا ئەڵێی؟ کەس هەیە حەزی بە تەعزێ بێ؟

هەڵشۆ: ئەی چییە؟ ناخۆشیان کرد.

تریفە: جا خۆ بەدەست خۆیان نییە داماوانە، قەزاوقەدەرەو ئەمری خوایە.

هەڵشۆ(( بێزار)): دە باشە دەی بڕۆو زوو بگەڕێیتەوە.

تریفە: ئەی جەنابت؟

هەڵشۆ: من ئیشم هەیە.

تریفە: یان دوامئەکەوی بزانی بەڕاست تەعزێ هەیە یان نییە؟

هەڵشۆ: دواشتکەوم حەقی خۆمە.

تریفە: من لەگەڵ تۆ دەرنابەم، کەیفی خۆتە چی ئەکەی بیکە. (( ئەچێتە دەرەوە، بە جیبەکەی خۆی ئەڕوات))

هەڵشۆ(( بە دەنگی بەرز)): خواحافیزت خانمی ڕەشپۆش!

Cut

دیمەنی – ٧٩٥ – ڕ/ د – قاوەخانەیەک:

(( شەنیا زۆر بێتاقەتە دانیشتووەو کۆفییەکی لەبەردەستدایە.. پاش کەمێک خۆ خەریک کردن بە مۆبایلەوە دەوران دێتە لای.. یەک ماچی خێرای بێ موبالات و دانیشتنەوە))

دەوران: تۆ نازانی وەک من بەردەوام خەندە بەلێوتەوە بێ.

شەنیا: ئاخر تۆ خەندەلێوی.

دەوران: نا خەندەلێو نیم، بەڵکو خەندە ئەخوڵقێنم.. جیاوازییەکەمان هەر ئەوەیە، من ئەو شتەی دڵم پێی خۆش بێ ئەیکەم و ئیتر هەڵە دروست نابێ، بەڵام تۆ ئەو شتەت پیخۆشە کە باوکت پێی خۆش بێ.. ئەمە چەندجار باوکت داغانت بکا؟

شەنیا: ئەوە پەیوەندی بە تێگەیشتنمانەوە هەیە لەسەر بەختەوەریی، وەرە خێزانەکەی منەوە، بزانە چیت بەسەردێ؟

دەوران: ئۆکەی! من ئەزانم خێزانەکەی تۆ هەر لە بنەڕەتەوە بەختەوەر نیین، دایکت کوا؟ لە داخی باوکت هەر کەس نەیزانی چۆن تەڵاقی وەرگرت و کێ لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوروپا، ماوەو نەماوە خۆت و قیتەی باوکتن...

شەنیا(( خەریکی مۆبایلە)): بەختەوەریی ڕاستەقینە، بڕیاردان و چێژ وەرگرتنە، یان شتێک بێ لە چێژەوە نزیک بێ، ئینجا دوای ئەوە مای لەیدی من my lady بۆ موحازەرەم بانگ نەکردووی، کێشەی تۆ ئەوەیە وائەزانی هەرکەسێکت بینی ئەبێ ئامۆژگاریی بکەی، سۆری، من قسەی کەس ناچێ بەگوێما.. خۆم بڕیار ئەدەم و بەختەوەریشم.

دەوران: ئەوە نییە بە ڕوخسارتەوە دیارە؟

شەنیا: با هەر لەسەر تۆنی تۆ منیش قسە بکەم، ئیمامی غەزالی ئەڵێت، بەختەوەریی چاو لە بینینی شتی جوانایە، بەختەوەریی گوێش لە بیستنی دەنگی خۆشدایە، تۆ چاوت بەختەوەر کردووم، بە جوانییەکەت، بەڵام گوێت پڕ کردم لە دڵتەنگیی.

دەوران: وایە قسەی هەق ڕەقە.

شەنیا: کە عەجیبی خوایە! من حەزم لە سەرکێشییە با بزانی، تەنها چێژ لەوەش وەرئەگرم، بەوە بەختەوەر ئەبم و خۆم پێی ڕازیم.

دەوران: ئۆکەی.. قسەم نییە لە میزاجی تۆیا.. بۆچیت بانگ کردووم؟ پەلەمە وا کاتی خولەکەیە!

شەنیا(( خەندە)): ئەی بۆ دوای خولەکە نەهاتی؟

دەوران: لەو باوەڕەیا بووم، ئیشەکەت خێرا بڵێیت و بڕۆم.

شەنیا: جا بۆ تۆ کاتت هێشتەوە؟

دەوران: ئەهـ ئیتر هیچ ناڵیم فەرموو.

شەنیا: پێویستیم بە بڕێک پارەیە!

دەوران: ناڵێم چەند، چونکە هەرچەند بڵێی لە خزمەتتایە.. بەڵام من ئەبێ بزانم بۆ چیتە؟ ئەو کاتە ئەتدەمێ.

شەنیا: پارەیەکم لە ڕاماڵ وەرگرتووە ئەمەوێ بۆی بگێڕمەوە.

دەوران: ڕاماڵ پارە لە تۆ وەرناگرێتەوە، درۆیەکیترم بۆ بکە.

شەنیا: سەیارە ئەکڕم.. مۆڵەت دەرئەکەم.

دەوران: درۆ ئەکەی، تۆ ٤٠٠ دۆلارێکت بەسە، بۆ دەرکردنی مۆڵەت.

شەنیا: ئەوەندەم بەسە.

دەوران(( لە جزدانەکەی چوارسەد دۆلار یان ٥٠٠ هەزاری ئەداتێ)): ئەشزانم مۆڵەتەکەش دەرناکەی.

شەنیا: هەر کە درۆت لەگەڵ ئەکەم، تۆ ئەیزانی.. جا یان هەموو قسەیەکم بە درۆ ئەزانی؟ یان پێمەوە دیارە.

دەوران (( هەڵئەسێ و خەندە)): ڕاستیشم لێ نەبینیوی هەهە.

(( کەمێک پاش ڕۆشتنی دەوران، شەنیا سەرەتاتکێیەکی بۆ ئەکاو ئەزانێ ڕۆشتووە.. بە خێرایی ئەچێ پارە ئەدات و بە پەلە ئەڕواتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٧٩٦ – ڕ – ئێوارەیەکی درەنگ – دوکانی لەنگە:

(( خدر٣ عەرەبانەکەی ئەباتە ژوورەوە بە هاوکاریی خزمانی.. ڕیزە سکەی جلەکان دوور خراوەتەوەو ٤ جێگەی تیا ڕاخراوە بە بەربلاویی.. خدر بە کلیل دەرگاکە دائەخا ئەگەر شووشەکان بوو، گەر دەڕابە بوو، یەکیان لە دەرەوە دائیئەخات و چوار پێنجێ لە خزمەکان لەو دەورو بەرە دووگۆڵیی ئەکەن))

خدر٣: دوو حەفتەیەو کابرا دەنگی نییە، وائەزانم چاودێریم بکەن و کە چوونە دەرەوەیەکم بوو بمفرێنن.

چەکدار: هەه نازانێ تا بە کڵاو نەگیرێ، ئێرە چۆڵ ناکرێ.

خدر٣: هیچیان پێ ناکرێ، زوو بخەون، با حەرەسیاتەکە لەو کوڕانە وەرگرن، منیش حەزم ئەکرد هاوکارتان بم.

چەکدار: هەه ئەتناسنەوەو ڕێسەکەمان لێ ئەبێتەوە بە خوری، بە کەڵک نایا.. ئێمە ئەچین کێشە نییە، چاودێریش بکەن ئەو هەمووەیان بۆ ناناسرێتەوە.

خدر٣: دەی لەشتان ساغ بێ، بخەون برا.

چەکدارەکان: شەوشاد

(( خدر٣ شەوشادیان ئەکات و لەسەر ئانیشک ڕائەکشێ))

Cut

دیمەنی – ٧٩٧ – ش/د – باخیماڵی گێلاس:

(( ئاكۆو گێلاس و نینا بە تازێباریی، دەسێكی بەسەریەوە گرتووەو ئانیشكی لەسەر كورسی.. دوو هەفتە بەسەر مەرگی ڕۆڤاندا تێپەڕیووە، بێ ماكیاژە، لە باخی ماڵەوە دانیشتوون))

ئاكۆ: شەهادە وەفاتت دەركردووە.

نینا (( بەكزیی)): بەڵێ لەگەڵ پورە گێلاسا چووین. دەرمانكرد.

ئاكۆ: ئیتر قەسام شەرعیەكەش دەركەن كچم، با دوای ئەوە لەبەرەوە دوكان و خانووەكە بكرێ بە ناوی تۆوەو بیگوێزنەوە سەر خۆت.. هەر كات ویستت بیفرۆشی ئەیفرۆشی.. بەڵام جارێ بە قسەی من ئەكەی، هەردووكیان بدە بە كرێ.

نینا: بەڕاستی كاك ئاكۆ سترێسی ئێوە نەبێ، حەز ئەكەم بیانفرۆشم و ماڵێكیترم هەبێ، با سەرچاوەكەی شۆڕش و ڕۆڤان كوێر نەبێتەوە، تازە چاوم بەرایی نادا ئەو دوكان و خانووە ببینمەوە.

گێلاس: قسەی سەیر مەكە نینا، بە تەنیا ئەچیتە خانوویەكەوە چی ئەكەی؟ خۆ تاقتاقكەرە نیت كچم، ئەوە بڕایەوە كە تۆ لێرەیت و هەموو شتێكیتر بیری خۆت بەرەوە.

نینا: دەستتان ماچ ئەكەم زۆر سوپاس.

ئاكۆ: ئەرێ سوپاسی چی ئەكەی نینا، ئەڵێی غەریبی بەم ماڵە؟!

(( بێدەنگیی))

گێلاس (( مۆزێكی بۆ ڕائەگرێ)): ئەوە بخۆ.

نینا: بەخوا پورێ هیچم بۆ ناخورێ، دەست ڕامەگرە تكایە.

گێلاس: لاساریی بەسە نینا، دوو هەفتەیە هیچت نەخواردووە(( تورەیی ناز)) بیگرە دەی!

نینا: ئای خوایە! بەخوا هیچم بۆ ناخورێ، توخوا لێمگەڕێ پورێ گیان.

ئاکۆ: تەنگە نەفەسییەکەت باش بوو؟

نینا(( مۆزەکە وەرئەگرێ)): ئەم هەفتەیە یەکجار بوورامەوە.. پورە گێلاسم بۆ بمێنێ، خۆ تا بەیانی بەدیارمەوە ناخەوێ.. ئیتر ئەو ئاگای لێبوو، باش بوو.

ئاکۆ: شۆکی ئەو دوو کارەساتەیە، من چوومەوە بۆلای دکتۆرەکە، وتی ئەگەر هەیە بیپەڕێنێ.. وا شوکور قسەکەی ئەو دەرچوو، بەو هیوایەی توشت نەبێتەوە.

گێلاس: ئیشەڵڵا.

(( نینا بە نابەدڵ قەپێکی بچووک لە مۆزەکە ئەدا ))

گێلاس: بە نابەدڵ مەیخۆ کچم.

نینا(( ئەگری)): ناتوانم پورێ گیان ناتوانم، ڕۆڤەم دێتەوە بەرچاو کە چۆن ئەیخوارد.
(( گریان و بە ڕاکردن ئەچێتە ژوورەوە ))

ئاکۆ: هەستە هەستە ئاگات لێی بێ، زەختیشی لێ مەکە، ئەم ماوەیە هەروا ئەبێ.

گێلاس(( هەڵئەسێ)): لەچاو خۆیا هەر زۆر باشیشە.

((چوونە ژوورەوەی گێلاس ))

Cut

دیمەنی – ٧٩٨ – ش/ن –ماڵی زوبێر:

(( زوبێرو ڕێژوان و بروسک و چیمەن و سەلوا دانیشتوون))

زوبێر: دەی سەفەری سەلامەتیی بێ.. ئیتر تا شتەکان دابین نەبێ نەگەڕێنەوە، هەرچییەکیشتان پێویست بوو، ئەوە ڤایبەرە تێلیگرامە ئیمۆیە، ئاگادارمان بکەنەوە.

بروسک: حەتمەن وا ئەکەین مامە گیان.

زوبێر: من زۆر پەلەی کردنەوەیمە، هەر کرایەوە ئیتر یەک خەم چییە نامێنێ.

سەلوا: خەمی ژنەکە نەبێ هههه.

زوبێر: کێشەم نییە ئێستا لێمگەڕێن، زۆر تەنیاو ئاسوودەم، من تاقەتی لێپرسینەوەو گوێ ڕاکێشانم نییە هههههههه.

ڕێژوان(( پێکەنین)): ئەی باوکە ئەوان گوێمان ڕائەکێشن و ئێمە گوێیان ڕائەکێشین و ئیتر ئاوا پێکەوە هەڵئەکەین هههه.

چیمەن: بە گاڵتەی مەگرە باوە.. ئیتر پێویستە کەسێک بە دیار سەرتەوە بێ، هەر هیچ نەبێ دەمەتەقێیەک، ئەوە چۆنە تا بەیانی لەگەڵ کەس قسە ناکەیت و دەمت بۆن ناکا؟ هههه.

بروسک: ئەی خوانەخواست، نەخۆشییەکە شتێک، هەر کەسێک هەبێت هەواڵمان بداتێ باشە.

زوبێر(( پێکەنین)): ڕۆڵە ئەوەی ئێوە ئەیڵێن بۆدی گاردە ژن نییە هههه.

(( دیالۆگ و پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٧٩٩ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( نارەوەن لە سەیارەکەی دائەبەزێت و دێت بەرەو لای هاوڕێ.. دوای سڵاو.. نیزامیش سەیارەکەی لە پشتی ئەو بە ماوەیەک ڕائەگرێت و دێت بەرەولای هاوڕێ))

نارەوەن: ئا ڕۆڵە پەنیر بێ ماست بێ شتێکم بۆ بێنەو چایەکی ڕوون.

هاوڕێ: بەسەرچاو نارەوەن خان، قەیماغیشم لایە ئەمڕۆ، بە گوێزو هەنگوینەوە حەزی لێ ناکەی؟

نارەوەن(( گەڕانەوە بۆ ئۆفیس و هەڵوێستەیەک)): نا نا شتێکی سادە بێت، یا ماست یا پەنیر.. خۆ ئەگەر شۆڤانت لایە، تا پێت بڵێم چیم بۆ بکەی!

(( سڵاوی نیزام و وەڵامدانەوەی نارەوەن و هاوڕێ))

هاوڕێ: باشە بەسەرچاو نارەوەن خان.. نا شۆڤانم لا نییە.

نارەوەن(( ئەڕوا بۆ ئۆفیس)): چاوت خۆش.

نیزام: ئەوە نارەوەن خان بوو؟

هاوڕێ: بەڵێ دایکی کاک ئامۆیە.. بۆ ئێوە خزم نیین؟

نیزام: نا هەر هاوڕێی کاک ئامۆم.. تۆزێ ئیشم پێیەتی با نانەکەی بخوا ئەچمە لای، حەز ئەکەی تۆش کە چووی پێی بڵێ.

هاوڕێ: ژنێکی زۆر باشە پێوتنی ناوێ، هەر یەکسەر بچۆ بۆ لای، دەست نانێ بەڕووی کەسەوە، هەرچیت بوێ بۆت ئەکا.

نیزام(( پێی سەیرە)): ئاوا؟؟؟ ئەوەندە باشە؟

هاوڕێ: جا خۆ هیچم نەوتووە جارێ.

نیزام: دەی نان و ماستەکەی بۆ ببەو تۆزێ بۆم باسکە.

(( وەڵامی هاوڕێ بە پۆزەتیف و نان و ماست بردن بۆ نارەوەن)) ——— Cut ———

دیمەنی – ٨٠٠ – ڕ / ن - قاوەخانەیەک:

(( ڕامال و دەوران نێرگەلەی بەدەستەوەیە، جلەکانی کەمێک وروژێنەرە دانیشتوون ))

دەوران: بەڕاستی هەرچەند لێتان ورد ئەبمەوە، نایەتە بەرچاوم ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆو شەنیا لە پیاسەیەکیشا بتانبینمەوە، نەک لە ماڵێکا.. کاکە تۆو ئەو شتێک نییە پێکەوە بتانبەستێتەوە، تۆ کوڕێکی ڕۆمانسی و شەرمن و سادە.. ئەویش کچێکی فرتوفێڵبازو هەڵخەڵەتێنەر، بەس بمزانیایە دوای چی ئەو کچە کەوتووی؟

ڕامال: خۆشم نازانم، تۆ ئەزانی لەبەرچاوی من جوانێکیتر نییە لە هەموو جیهاندا، شێوەیەکی بچێتەوە سەر ئەو.

دەوران: بە منیشەوە؟

ڕامال: پێت ناخۆش نەبێ دەوران گیان، هەموو دنیا ئەڵێن پەنجەیەکی دەوران، هەموو شەنیا ئەهێنێ، بە جوانیەکەشیەوە.. ئەزانی من وا ئەزانم سەرپاکیان درۆزنن و ئەیانەوێ لە بەرچاومی بخەن؟ ئیتر ئەمە دڵە بڵێم چی؟

دەوران: جا توخوا بەوەش ئەڵێی دڵ؟ من زۆرم بینیوە بۆ یەکێک کوێراییان دایەت و کەسیتر نابینن، جاری وا هەیە، ناڕاستەوخۆ هەموو شتێکیشی پێ ئەڵێن، کەچی ئەوەندە گەمژە ئەبێ، وا ئەزانێ ئەویتریش باسی موعانات ئەکا.. تۆش لەو بابەتەی.

ڕامال: ئەی چۆنە پێت بڵێم لەوانەیە ئەو کەسانە گوێیان لە دەنگی هیچ کەسێکیتر نەبێ، جگە لەو کەسەی کە بووە بە سەرچاوەی ژیانی، دیارە من لەو کەسانەم.

دەوران: کورە تۆ هەر نەتکردبێ؟! هههه.

ڕامال: قسەکەت بیربردمەوە بەو ئەملاولا کردنەت.. من وتم کارێکی وام بۆ بکە، ڕازی بێ هاوسەرگیریم لەگەڵ بکا، من ئەزانم قسەی تۆ نەبێ، گوێ لە هیچ کەسێک ناگرێ. دەوران ئەوەم بکەی، چ شتێ لە دنیادا دڵت ئەخوازێ بەڵێن بێ بۆت بکەم.. بڵێی کارگەکەشتم بدەرێ بەڵێن بێ بیکەم بە ناوی خۆتەوە.

دەوران: خەیاڵ پلاوێکی عەجاییبت هەیە ڕاماڵ.. ئەو کچە ئەگەر بەختەوەریشتکا، بەختەوەرییەکی شەیتانانەیە.. ئەو کچە ڕوویەکی مرۆڤەو ئەویتی شەیتان، من ڕاستت پێ ئەڵێم نامەوێ فریو بخۆی.

ڕاماڵ: ڕاستە ئەو کچە دوو دیوی هەیە دەوران گیان.. دیوێکی بە حەق فریشتەیەو دیوەکەیتری پەری، گەر هەموو دنیا قسەی لەسەر بکەن، لای من ئیتر ئاوایە.

دەوران: من هەولێکیتریشی لەگەڵا ئەدەمەوە، تۆ چل هەزارت داوەتێ؟

ڕاماڵ: تکایە باسی پارە مەکە.

دەوران: ئەو خۆی باسیکرد.. باشە تۆ بۆ نایەی نیوەی ئەوە بدەی بە من و..........

ڕاماڵ (( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): کچێ تۆ وەک خوشکم وای، باسی خۆت مەکە هیییییچ!

دەوران (( تورەبوونی ناز)): کێ باسی خۆمی کردووە گێژە، بۆ ئەوەیان هەزاری وەک تۆ بە بەردەرگایا بڕوا ئەچم دەرگاکەیان لەسەر دائەخەم، بەڵام وەک هاورێ قبوڵی.

ڕاماڵ: ئەی ویستت بڵێی چی؟ وا خێرا داتگرتمەوە.

دەوران: ویستم بڵێم نیوەی ئەو پارەیەم بدەرێ جوانترین کچت بۆ ئەدۆزمەوە.

ڕاماڵ: نەوەڵا نیوەی ئەو پارەیەت ئەدەمێ و خۆی ڕازییکە.

دەوران: باشە هەولێکیتریش ئەدەم، بەس دواجار بێ، ئیتر مێشکم نەبەی.

(( نێرگەلەی دەوران و قاوەخواردنەوەی ڕاماڵ))

Cut

دیمەنی – ٨٠١ – ڕ/ د – عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ نۆکاو تێ ئەکا بۆ کەسێک و زەنگی بۆ دێت.. ئاڵەت ئەخاتە بەردەستی کەسەکەو ئەچێتە لایەکەوە))

خدر٣: وتم ئیشەڵڵا لە کۆڵم بوونەتەوە.

پاشا (( دەنگ)): خۆ بە کۆڵتەوە نیم برا؟

خدر٣: دەی بڵێ کەی دێیت؟

پاشا: کاکە گیان گوێم لێ بگرە.. من بەو دەمامکەوە ناتوانم بێمە دوکانی تۆ.

خدر٣: جا دەمامکت بۆچییە؟ ڕووبەڕوو قسە ئەکەین، وانەبێ بێی بۆ دوکانەکەشم گفتم لێوەرناگری.

پاشا: کاکە گیان ئەبێ خۆم و خۆت بە تەنیا بین، ئەوسا خۆمت لێ ئاشکرا ئەکەم، هەر لەبەر پیاوەکانم، نابێ ڕوخسارم ببینن، ئەوان هەموو خەڵکی شارن و بمناسنەوە خراپە، کێ ئەڵێ پیاوخراپیان تیا نییە.

خدر٣: وایە، ئەی نیازی چیت هەیە؟ مەعز بۆ خوا بۆ واز لەم بەزمە ناهێنی؟ وەڵا پورزا ئەوە زۆر سەرێشەیە بۆ من.

پاشا: نا کاکە.. بە دڵی خۆت ماڵێک هەڵبژێرەو من و پیاوەکانم دێینە ئەوێ و لە ژوورەوە دوو بە دوو قسە ئەکەین.

خدر٣: ئەرێ من بیستوومە پیاوان ژنیان هەیە، کەچی تۆ پیاوت هەیە؟ (( بە دەنگێکی بەرزی نەشاز پێکەنینێکی زۆر))

پاشا: دەی پێم بڵێ بێمە کوێ؟ واز لە پێکەنین بێنە، دەی کاکە بەس پێبکەنە.

خدر٣(( دوای پێکەنین)): وتت چی؟ هههههە.

پاشا: بێمە کوێ برا؟

خدر٣: وەڵا بەم دەمودەستە ناتوانم هیچ شوێنێک بڵێم، بەخواماڵێک شک نابەم لە خەیاڵما بێ.. تۆ شەوێ تەلەفونم بۆ بکەو پێیت ئەڵێم وەرە چ شوێنێک.

پاشا: باشە، بەڵام بۆ دوو بەیانی.. ئیتر خۆت کاتەکە دیاری بکە.

خدر٣: باشە پورزا.. شەو تەلەفون بکەی، نەیکەی بە بەزمی شاخ و داخەکە، ئەگینا بە قەبری باوکم، تا مابی جوابی تەلەفونت نادەمەوە.

پاشا: باشە بەسەرچاو.. دەی خوات لەگەڵ.

خدر٣: خواحافییز!!!!

(( ئەگەڕێتەوە سەر عارەبانەکەی))

Cut

دیمەنی – ٨٠٢ –ڕ /ن - ئۆفیسی وەکالەت:

(( نیزام و نارەوەن دانیشتوون))

نارەوەن: ئامۆ نایەتەوە ئێرە.. هەرچییەک بە من بکرێ لە خزمەتدام.

نیزام: نارەوەن خان باسی تۆیان بۆ کردووم، چەند ژنێکی باش و خانەدانی! هاتووم هەندێ پرسیارت سەبارەت بە شەنیای کچم لێ بکەم.. هەڵبەت چیرۆکی عەشقەکەیان لەگەڵ کاکە ئامۆدا ئەزانی.

نارەوەن: ئۆو بۆ نەتوت باوکی شەنیا گیانم (( زۆر بە گەرمیی بەخێرهاتنی ئەکاتەوە))

فەرمووە فەرمووە ئەمرکە براکەم، لە خزمەتدام، ئۆو ماشەڵڵا پێتەوە دیار نییە شازادەیەکی وا جوان و گەورەت هەبێ، خوا نەیبڕێ و تۆشی هەر بۆ بمێنی.

نیزام، زۆر سوپاس، سوپاس.. ڕاستییەکەی هەستمکرد کاکە ئامۆو شەنیا کەمێک لە یەک دوورکەوتبنەوە، بەڕاستی لەوانەیە باوکێکیتر بووایە، تەنها لە کچەکەی خۆی بپرسیایەتەوە. بەڵام من لە پێشدا ویستم پرسیار لە ئێوە بکەم.

نارەوەن: نا ئەوەم نەزانیوە کاکە نیزام، بۆ؟؟؟

نیزام: خۆت ئەزانی خەڵکێکی زۆر پێکەوە بینیونی و نیمچە ئاشکرابوونێک ئاشکرا بوون لای خەڵک، عاجزیەکەیان گەر تووڵ بکێشێ، بۆشانی ئێمە زۆر خراپە، خۆت ئەزانی لەم کۆمەڵگەیەدا پیاو شانازیی بەوەوە ئەکا زۆرترین کچ بکاتە یاری خۆی و هەموو سوکایەتیی و نەنگییەکەش ئەبێتە بار بەسەرشانی کچەی داماوە.

نارەوەن: قسەکەت زۆر جوانە، ئەرەوەڵا خەڵک ئەوەی باکی نەبێ باسکردنی ئافرەتە قوڕ بەسەرەکەیە، پەڕوپۆی لەبەر ئەبڕن.

نیزام: بە ڕاستی باشتر بوو جەنابت لێرە بووی چونکە باشتر تێئەگەی.. ئێستا ئەگەر کچێکی تۆ ئاوای بەسەر بێت و کوڕێک قۆڵی ببڕێ چی ئەکەی؟ هەر بڕیارێکتدا من ملم لە موو باریکترە.

نارەوەن: جا وەڵا من ئەبێ قسەیەک لەگەڵ ئامۆیا بکەم و بزانم هۆکارەکەی چییە، ئەگەر هەر خولیا هەرزەکارانەکە بێ، لێی قبوڵ ناکەم، من شەنیا گیانم زۆر خۆش ئەوێ.. ئەگەر شتیتریش بێ ئەوە نازانم، جارێ لێی بپرسم باشترە، وا نییە؟

نیزام: خۆت ژیرو دانای نارەوەن خان، ئەوی بە باشی بزانی، منیش بە باشی ئەزانم.

نارەوەن: لە خزمەتتانام هەرچیم پێ بکرێ.

نیزام: ڕاستیەکەی منیش تەنیام و خواو ئەو کچەم شک ئەبەم.. ئیتر نە ژن و نە کوڕێک و کەس کەسم نییە، ناچار خۆم بیپارێزم.. کوڕی تۆ لە پیاوە باشەکانەو زۆر دڵم پێی خۆش بوو کە ناسیم، هیوادارم پێچەوانەی یەکەم سەرنجم دەرنەچێ.

نارەوەن: ڕەنگە ئاوا بووایە قسەیەکیترم بکردایە، ڕاستیەکەی ئەو کەمێک چاوبگێڕە، بەڵام ئامۆم زۆر شەرمنەو لە بەزمی ژن و ژاڵیش زۆر دوورە، بۆیە وا ئەزانم لەبەر هۆیەکی گرنگ ئەوەی کردبێ.

نیزام(( حەزەر کردن)): خۆ ئەگەر نەیوت، زۆریشی لێ مەکە هۆیەکەت پێ بڵێ، هەر ئەوەندە خۆم ببینێ و ڕاستییەکەیم پێ بڵێ.

نارەوەن: تازە من و تۆ بووین بە خوشک و برا کاکە نیزام، ئەکەوینە بەینیانەوەو بە هیوای ئەوەم، ئەگەر هۆکاری جەوهەریی نەبێ. بتوانین زوو پێکیان بهێنینەوە.

نیزام: هۆکاری جەوهەریی وەکو چی نارەوەن خان؟ کچی من لە ئاوی شەوێ پاکترە.

نارەوەن: نا نا خۆ مەرج هەر ڕەوشت نییە.. بۆ نمونە دزییە لە یەکێکیانەوە، ناپاکیی کردنێکە، درۆ کردنی یەکێکیانەو ئەویتریان پێی زانیبێ، هەروا بێتەوە پارە لێکێشانەوەیەکە، بێدڵیی کردنی یەکترە، کورە شتی جەوهەریی ئەوەندە زۆرە لە باسکردن نایە.. بەس لای خۆمان لەگەڵ وتت جەوهەریی، یەکسەر ئەیباتەوە سەر ڕەوشت.. بەخوا شتی وا هەیە لە ترۆپکی بێ ڕەوشتیدایەو خەڵک بە شانازیی ئەزانێ.

نیزام(( سڵکردنەوە)): وەکو چ شتێ بۆ نمونە؟

نارەوەن: بۆ نمونە، دزیی کردن یان قۆڵبڕین، یان یاری کردن بە کچان، یا پارە لێکێشانەوە لە خەڵکیی، یا بوختانکردن، یا کورە قاچاخچێتیی تلیاک تلیاک، چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەندن.. گەر کەسەکە لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێ لەسەر هەریەکێ لەوانە، بە شانازیی و سنگ دەرپەڕاندنەوە باسی ئەکا.

نیزام: نارەوەن خان لەوانەیە شتێ لە هۆکاری دوورکەوتنەوەیان بزانی؟!

نارەوەن: نا من هیچ نازانم باوەڕکە، لە خۆمەوە ئەو قسانە ئەکەم، ئەی خۆت داوای نمونەت نەکرد؟.. بەس بە چیبیا وا تێگەیشتی شتێ بزانم؟

نیزام: وەڵا بڵێم چی؟ تیرەکانت بەرەو شوێنێک ئەهاوی، کە تێ ناگەم ڕوو لە کوێیە؟

نارەوەن: ئۆۆۆۆی حەیفت نەکرد کاکە نیزام، هەزار پەرژینی قایم بێ لە ڕووتا، من حەددی ئەوەم نییە لە ڕووی جەنابتا ئەو قسانە بکەم، من بە پەروەردەی شەنیاگیانا ئەزانم چەند نەجیبی.

نیزام: سوپاس نەجابەتی خۆتانە.. (( هەڵئەسێ)) کەواتە من سبەی بێمەوە بۆ قسەکردن؟

نارەوەن: هەر کاتێک تەشریف بێنی گەورەم ئەکەی.. من زۆر خۆشحاڵ بووم بە ناسینت و بەڕاستی دانیشتن لەگەڵ کەسایەتی بەڕێزو قسە خۆشی وەک جەنابتا ئاسوودەم ئەکا.

نیزام: نا نا هەر ئەم دانیشتنمان نابێ ئیشەڵڵا.. زۆر خۆشحاڵ ئەبم هامشۆی خێزانیشمان هەبێت و جاروبار دەعوەتی منیش بیت، ئەگەر ئاسایی بێ.

نارەوەن: ئۆوو دەعوەت و دەعوەتکارییم زۆر پێخۆشە، بە تایبەت لە دەرەوە.

نیزام: ئەگەر حەز بکەی سەیرانیش ئەکەین.

نارەوەن: نا، قەت حەزم لە چوونە دەرەوەی شار نییە، هەر ناوشار.

نیزام: باشە نارەوەن خان گیان، من لە خزمەتتا ئەبم، هەر سبەی کە هاتمەوە لات، یەکەمین دەعوەتت ئەکەم.

نارەوەن(( ئاماژەی لایک ئەکا)): قبوڵە.

نیزام: دەی لەسەر ئیزنی تۆ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتی نیزام و سەربادانی نارەوەن و جوڵەی دەم بە ئاماژەی باش تێگەیشتنی خۆی و گەمژەیی نیزام))

Cut

دیمەنی – ٨٠٣ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی نیگار:

(( نیگار ئەچێتە سەیارەکەیەوە، دەوران بە ڕاکردن و بە جلی ماڵەوە دێتە دەرەوە))

دەوران(( بە دەنگی بەرز بانگی ئەکا)): نیگار، نیگار.. دایکە بوەستە.

نیگار: ئەو شاتەشاتەت لە چییە شرشێت؟

دەوران: بوەستە، نازانی سەیارەم پێ نییە؟ بمگەیەنە.

نیگار: لەگەڵ پەرێژو چپەیا بۆ ناڕۆی؟

دەوران: ئەوان نیوەڕۆ خەو ئەکەن، منیش پەلەمە.

نیگار: ئەی خوا هاوار، خۆم کەمم ئیش هەیە، ئینجا چاوەڕوانی تۆش بکەم؟! دە خێراکە وەرە.

دەوران: هەر ئێستا ئەها ئەهـ (( بە ڕاکردن ئەڕوا))

نیگار (( تێل ئەکا)): ڕەمزی کەمێ دوائەکەوم، ئەبێ کچەکە بگەیەنمە کارگە، سەیارەکەی خۆی هاوڕێیەکی لێی وەرگرتووە ژن ئەهێنێ ............. خۆت چاودێریی کرێکارەکان بکەو سەربەستبە............. باشە بەقوربان، دەستخۆش دەی بای.

(( نیگار چاوەڕوانی دەورانە))

Cut

دیمەنی – ٨٠٤ – ڕ / ن – ژووری عەقید بەهێز:

(( بەهێز تێل ئەکا، بە پێوە دێت و ئەچێ))

بەهێز: شوێنێکی زۆر باشمان دیاریکردووە.

خدر(( دەنگ)) بەڵێ گەورەم، وابێ دەرفەتی ئەملاولای نەبێ.

بەهێز: بەڵێ شوێنێکمان وامان هەڵبژاردووە، ناتوانێ چەکی ئۆتۆماتیکییش بێنێ، گەر بشیهێنێ بە خێرایی کۆنترۆڵ ئەکرێ.. کە ناونیشانەکەت دایێ، بڵێ کێ لەگەڵ خۆشتا ئەهێنی بیهێنە..

خدر: ئەگەر دە کەسیش بوو؟

بەهێز: بەڵێ با پەنجاش بێ سەدیش بێ هەموو شتێکمان چارەسەر کردووە.. خەمت نەبێ.

خدر: کەواتە ناونیشانەکەم بدەرێ.

# (( ئەڵقەی سی و نۆ))

بەهێز: ئوتێلە تازەکەی سەررێی نەخۆشخانە، ئەوی لای فلکەکەوە.

خدر: شوێنەکە زۆر باشە گەورەم، ئەزانم کوێیەو تەواو شارەزام.. دەستتانخۆش.

بەهێز: بەسەرکەوتوویی، خۆشم لەوێ ئەبم.

خدر: زۆر سوپاس گەورەم.

(( خواحافیزیی و داخستنەوەی تەلەفۆن))

Cut

دیمەنی – ٨٠٥ – ڕ/ د – چایخانەکەی تر:

(( هەڵشۆو نیزام و شاموراد ))

(( پێکەنینی هەرسێکیان ))

هەڵشۆ: ئەشهەدوو عەننابییە.

شاموراد: جا ئاوا دەستوبرد؟

نیزام: بەسەری ئێوە خۆم جارێ دوای ئەخەم، ئەگینا، هەر زۆر شلە.. ئەمڕۆ ئەتوانم قسەی لەگەڵ بکەمەوەو دوو سبەی بێم لەم کاک هەڵشۆ داماوەی داوا بکەم.

(( پێکەنینی هەموو ))

هەڵشۆ: بەس بمزانیایە ئەم ژنە بۆ وا لەگەڵ منا گیرەو دۆلارێکی لێ هەڵناوەرێ، کەچی لەگەڵ هەموو کەسێکا هەڵیئەڕێژێ؟

شاموراد: ناوچەوانەکەیە کاکە هههە.

نیزام: نەوەڵا لێی نازانی.

هەڵشۆ: چۆن؟

(( لەوکاتەدا شەنیا دێت و هەڵشۆ چاوبزانە دیقەتی ئەدا ))

نیزام(( بۆ شەنیا )): ها کچی باوەی، خێربوو هاتی؟

شەنیا(( بەدەست سلام ئەکا )): سەلام.

(( بەخێرهاتنی گەرمی هەڵشۆو ئەوانیتر وەڵام ))

شەنیا: ها کاک عەننابی چۆنی؟.. ژنەکەت هەروا زاڵە بەسەرتا؟

هەڵشۆ(( سەردائەخا )): سوپاس دادە شەنیا گیان، نا یەکجار وانییە.

نیزام(( کەمێک گرژ)): تۆ بۆچی هاتووی؟

شەنیا: پارەم ئەوێ و ئەمشەو لەماڵی دەوران ئەمێنینەوە.

نیزام(( هەندێ پارەی دەرئەهێنێ و لە چنگیا ئەیداتێ)): ها بگرە، نەموت نەیەی بۆ ئێرە؟

شەنیا: (( پارەکە ئەژمێرێ)) وەڵا جەوەکەتان زۆر خۆشە حەزمکرد بێم، ئەگەر چایەکم بۆ بانگکەن؟ دائەنیشم.

هەڵشۆ: وەڵا عەنتابییە بۆ نا؟

شەنیا: ئەهـ ئەوە کاک عەنتابییش ئەڵێ عەنتابییە.

نیزام(( تورە)): شەنیا وتم برۆ.

شەنیا(( تحیەیەک و ئەڕوا)): سەرچاو.. سوپاس باوکە.

هەڵشۆ: ئەرێ ئەوە بۆ وا لێی تورە ئەبی؟ گوناحە.

شاموراد: تۆ حقت چییە کچی خۆی نییە؟

نیزام: با فێر نەبێ بێتە ئێرە.

Cut

دیمەنی – ٨٠٦ – ڕ/ن – عیادەی دکتۆری دەروونیی:

(( دکتۆرو زوبێر))

زوبێر: من بە هەموو ئەو مەرجانەت ڕازیم دکتۆر گیان.. جێدەستی جەنابت بە نەخۆشخانەکەوە دیار ئەبێ.

دکتۆر: بەو هیوایەی بتوانین شتێک بکەین، خزمەتێکی باش بە خەڵک بگەیەنین.

زوبێر: تەواو ڕێککەوتین(( جموجوڵی تێئەکەوێ و ئەکەوێتە سەرلا، وەک خۆی بۆ شتێک ئامادەکا بیڵێ)) دکتۆر ئەمەوێ پرسیارێکیشت لێ بکەم سەبارەت بە تۆڵە سەندنەوە، جا کاتیەتی یان دوای بخەین بۆ کاتێکیتر؟

دکتۆر: وەڵامەکەی کورتە مامۆستای بەڕێز.. تۆڵەکردنەوە لە چەند حاڵەتێکدا سەر هەڵئەدا.. یان کەسەکە نارسیسییەو ئاگای لە خۆی نییە، بەوەی کە خودی خۆی بە پاڵاوتەیەکی خوایی ئەزانێت و وا ئەزانێ ئەوانیتر یان بەقەدەر ئەم دەستڕۆشتوو یان جوان یان دەوڵەمەند یان ڕۆشنبیر نیین، بەوەش خۆی لە سەروو ئەوانەوە دائەنێ.

زوبێر: ئەها یەعنی کەسەکە لە لایەنی دەروونییەوە نەخۆش نییە؟

دکتۆر: هەه هەر نارسیسیی بۆ خۆی نەخۆشییە.

زوبێر: تەنها ئەو هۆکارەی هەیە؟

دکتۆر: ئۆو ئەوە تۆ ئەڵێی چی مامۆستا، هۆکاری لە ژمارە نایەن، بەڵام لە کەسی شەڕەنگێزدا مەترسیدارترینەو بە پلەی دووەم نارسیس بوونیش مەترسیدارەو ئەوسا پلەیتر دێت.

زوبێر: ببورە کاتیشت ئەگرم، بەڵام وەک چ شتێک لە پلەی دوای ئەودا؟

دکتۆر: بۆ نمونە لە باری هستیریشدا ئەوە سەر هەڵئەدا، کاتێ مرۆڤ بە لە دەستدانی ئازیزێکی توشی ئەو بارە ئەبێت هەوڵی تۆڵە سەندنەوە ئەدا.. ئەوەش لە توڕەبوونی زۆرەوە سەرچاوە ئەگرێ.. یان کاتێ ئەبینی زوڵمێک هەیەو حەقەکە ناگەڕێتەوە بۆ

خاوەنی و چاریش نییە ئەبێ قبوڵ بکرێ، یان یەکێ ئازارت ئەدا.. فرۆید لە دەروونشیکاریی کەسێتیی هاملێتا ئەو ئارەزووی تۆڵە کردنەوەیە ئەگێڕێتەوە بۆ نائومێد بوونی ناسینی دایکی و بە جۆرە خەمۆکییەکی دائەنێ.

زوبێر(( جددی و حماس)): ئادەی ئەوەیان چۆن دکتۆر گیان؟

دکتۆر: ئا.. باسی جۆرە خەمۆکییەک ئەکا، کە هاملێت هەیبووە بە ناوی میلانخۆلیاوە.

زوبێر: نیشانەی ئەو خەمۆکییە ڕوونە دکتۆر؟

دکتۆر: بەڵێ.. دەرکەوتنی پارادۆکس واتە دوو هەڵسوکەوتی دژ بەیەک یان زیاتر، لە هەڵسوکەوتی کەسێتیی خەمۆکدا. ئەوە دیاترین نیشانەیەتی.

زوبێر: بۆ نمونە، کەسێکی لێبوردەو ڕۆشنبیریش بێ.. بیەوێت تۆڵە لە کەسێکی نزیکی بکاتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە بۆتە مەترسیی سەر ژیانی ئازیزترینی و هەرگیز ئەوەی لەو کەسە ڕانەبینیوە، بۆیە تۆڵە ئەکاتەوە.. ئەوە پارادۆکسەکەیە؟

دکتۆر: پێشتر وەڵامەکەیت وەرگرتەوە مامۆستا.. بەڵام ئەگەر کەسەکەت زۆر لا مەبەستە، با بێتەلام، بە تەنها دانیشتنێک نەخۆشییەکەی دیاری ئەکەین.

زوبێر(( هەڵئەسێ)): واو کەواتە نەخۆشییە؟

دکتۆر: هیچ جۆرە تۆڵەکردنەوەیەک بارێکی تەندروست نییە.

زوبێر(( تەوقە)): زۆر سوپاس دکتۆر گیان، پێداویستییەکانت دیاری بکەو لە کورتترین ماوەدا ئەیگەیەنینە نەخۆشخانەکە.. زۆر سوپاس، ببورە کاتیشم گرتی.

Cut

دیمەنی – ٨٠٧ – ڕ/ن - ماڵی گێلاس:

(( نینا لەسەر طباخ برنج هەڵئەگێڕێتەوەو ئەگری لەبەر خۆیەوە.. پاش سەرداپۆشینەوەی ئەگەڕێتەوە سەر مێزەکەو دائەنیشێ.. هەردوو دەست ئەخاتە ژێر چەنەی پاش فرمێسک سڕین))

<u>**نینا مۆنۆلۆژی ناوەوە**</u>:

باشە ئەوە مانگێ دوو مانگ بەم شێوەیە بووم بە بار بەسەر ماڵی پورەوە.. ئەی دوای ئەوە؟ خۆ بچمە ماڵی مامە یاسین هەر کچەکانی بە تیرو توانج ئەمکوژن.. ماڵی مامە حەمە؟ ئای لە چاوبزیی هەریادی کوڕی؟! هەر بە چآو ئەمخوا.. (( کەمێک بێدەنگیی و ڕامان)) ئاواش لە پرسەکەی باوکما چی کرد چی کرد خوایە، چەند گەرم و گوڕ بوو، بە تەعزێی باوکی خۆی ئەزانی.. کەچی لەوەی ڕۆڤە گیانا زۆر ساردو سڕ بوو.. ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە پێموت ئەگەر ئاوا بوو ڕووی مەدەرێ و نەهێڵی بێتە ژوورەوە، عاجزی کردبێ.. چاوی دەرئەهات خەڵک لە تەعزێیا چۆن عاجزیی ئەخوێنێتەوە؟ (( وەستانێک)) چی لێ بکەم؟ ئیشی چیم پێیەتی تا سارد بێ یان گەرم، من ڕاسپاردەی باوکم چۆن ئەشکێنم؟ نا هەر خراپ بوو بە خەیاڵیشما هات.. ئای خوایە چەند ناخۆشە بەسەر ماڵانیشەوە بیت و هیچ دەسەڵاتێکیشت نەبێ.. مەگەر هەر ماوەیەکیترو بەو هەموو برینەوە شوو بکەم و بچمە ماڵی خۆمەوە.. بەڵام بە ئاوا نا.. نا ئاوا نا نە نە نە نە.. هەر پیاو زۆرە.

(( هەڵئەسێ و تەماشای چیشتەکانی ئەکا))

__________ Cut __________

دیمەنی – ٨٠٨ – ڕ– عەسری  درەنگ/ د – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان دێت، هاوڕێ خەریکی قۆری و پیاڵە شتنە))

ئەردەڵان: چییە خۆ ئەوە ئەڵێی بەزیایی ئەکەی؟ من تازە بۆ چا هاتووم.

هاوڕێ: ئەی بۆ کلیلی سنوقەکەت نەدەمێ ئەردە گیان، دوایی خۆت شتەکان بشۆو سنوقەکەش داخەرەوە هههە.

ئەردەڵان: خۆ تۆش کلیلی سەراخانەم نادەیتێ ماڵم ئاوا کردی، بۆ توانجم تێ ئەگری؟

هاوڕێ: خۆت ئەزانی ئەم کاتانە چام نامێنێ، ئیتر بۆ ڕەزای خۆت تاڵ ئەکەی؟

ئەردەڵان: وەڵا ڕەنگە یەکجاریی تاڵیکەم هاوڕێ گیان.

هاوڕێ(( لێپرسینەوە)): ئەمجارە بە چیییییی؟

ئەردەڵان: بەخوا تاقەتم لە تەنیایی و بێکەسیی چوو.. جا ئەڵێن بەرد لە جێگەی خۆی سەنگینە.........

هاوڕێ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): جا بۆ دیسان ناڵێی ئەچمەوە دێکەی خۆمان؟ خۆ قسەی یەکەمجارت نییە.. بەیانی هەستای دێیتەوە ئێرەو ئەڵێی وەڵا هەر ئاگام لە ڕێگەو مێگەش نەبوو، کاتێکم زانی بارم لە عەرەبانەکە ناوە.

ئەردەڵان: نا ئەمجارەیان بەڕاستمە.

هاوڕێ: قسەت یەک بست نارِوا، کە کردت بەڕاست پێش ئەوە وەرەو خواحافیزیم لێ بکەو منیش بە دوو قسە ساردت ئەکەمەوە هههەه.

ئەردەڵان: جا خوایە کە تۆش ملۆزمی بۆ گیانی من.. ئاخر نەتپرسی بۆ واموت؟

هاوڕێ: لە کەسێ دڵگران بوویت و ئەتەوێ سەری خۆت هەڵگری.

خدر: نەوەڵا بیری حمەخدر ئەکەم، چاوم بەرایی نادا ئەم شوێنە بێ ئەو ببینم.

هاوڕێ: مۆڵەتە مۆڵەت بێ ئەقڵ ئەگەڕێتەوە.

ئەردەڵان: بەخوا وا دیارە یەکجاریی بێ هاوڕێ، خۆ دنکەکەشی هاتەوەو ئەو هەر نەگەڕایەوە.. کەواتە ناگەڕێتەوە.

هاوڕێ: ئۆوهۆ دیسان بەزمە.. باشە کە تۆ شار جێ ئەهێڵێت لەبەر کاک حەمەخدر؟ ئیتر بۆ خەڵک ئەنێی بە قنگیەوە؟ دەی ئەوە قسەکەشت وا دەرنەچوو و هەر نەشگەڕایەوە.

ئەردەڵان: بەخوا ئەو لەبەر نارەوەن خان نەگەڕێتەوە، لەبەر من هەر ناگەڕێێێێێتەوە!!

Cut

دیمەنی – ٨٠٩ – ئێوارەی درەنگ/ د – بەردەمی ماڵی نیگار:

(( شەنیاو دڵنیاو دەوران، بە سەیارەی دەوران دێنەوە.. شەنیاو دڵنیا دائەبەزن))

شەنیا: ئەی تۆ بۆ دانابەزی؟

دەوران: دڵنیا ئەچین ئارەزووش ئەهێنین و ئەمشەو لێرەبە حەز ئەکەم.

دڵنیا: ئۆی ئۆی ئەوە ئەڵێی چی؟ خۆت نازانی کاکم چیم پێ ئەکا؟

دەوران: کە ئارەزووت لەگەڵا بێ هیچ ناڵێ.

دڵنیا: وایە لەبەرچاوی ئێوە هیچ خۆی تێک نادا.. بەڵام خۆم ئەزانم چۆن بەیانی کە گەڕامەوە دەرگای دۆزەخەکەیم بۆ ئەخاتە سەرپشت و بێ سێ و دوو خۆم شارەزام، ئەبێ بچمە ژوورەوە.

شەنیا: یەعنی پێشت بە فەرموو ناکا هههها.

دڵنیا: نەوەڵا شەنیا، خۆم شارەزام.

دەوران: من داوای لێئەکەم باوەڕ ناکەم دڵم بشکێنێ، ئەڵێم جەژنی لەدایک بوونمە، هەر ئەمشەو.

دڵنیا: تکا ئەکەم لێبگەڕێ، ئەگەر نەتتوانی بمگەیەنی، قەینا بە تەکسی ئەڕۆمەوە.

دەوران(( کە تەنها سەری هێناوەتە دەرەوە)): ئۆوهۆو جا تۆش کەللەڕەقی خوایە!

(( سەیارە ڕائەگرێ و دائەبەزێ))

——————— تابع ——————— Cut ———————

**(( تێبینی: ئەکرێ چوونە ژوورەوەو سڵاوکردن لە نیگار لە هۆڵەکەو تا ژووری دەوران، بکرێ بە دیمەنی جیاواز))**

دیمەنی – ٨١٠ – متبوع – ش/ن – ماڵی نیگار/ ژووری دەوران:

(( ماڵێکی ڕاقی.. دەوران خەریکی نینۆکییەتی و شەنیا لەبەرخۆیەوە گۆرانی ئەڵێت و خەریکی دەم و چاویەتی، وەک بە موکێش تووک لێکردنەوە یان گەڕان بۆ زیپکەو ڕەشیی دەرهێنان.. دڵنیاش، بە مۆبایلەوە خەریکە))

دەوران(( سەر هەڵنابڕێ)): ئەرێ حەز حەزت لە چییە؟ خۆشەویستیی و تەڕەماشی چی؟ حەز ئەکەی بەیانی پێنجت بۆ داونلۆد ئەکەم و ئێوارە هەر پێنجیان سێلێکت ئەکەم بۆ ڕیزایکلەکە.

شەنیا: یەعنی بۆ تەنەکە خۆڵەکە هههههههە خۆ تێ ئەگەی دڵنیا خانم.

دەوران: دڵنیا گیان خۆ ئێمە دووجار نازیین چاوەکەم (( سەرهەڵئەبڕێ بۆ شەنیا)) توخوا وا نییە شەنیا؟

شەنیا: ئەوە شایەتیی منی ناوێ، خۆشی ئەیزانێ.. (( بەسەر ئاماژە بۆ دەوران ئەکا کە دڵنیا خەریکی مۆبایلە)).

دڵنیا(( بێ سەر هەڵبڕین)): ئەرێ تۆزێ زۆر ناڵێن ئێوە؟ لێمگەڕێن وا خەریکە قسەی خۆشم بۆ ئەکا.

شەنیا: حەز ئەکەی بەقوربان و بەساقەوبێ (( خۆی و دەوران پێکەنینی بەرز)) مۆبایلەکەم بەرێ بە ناوی خۆتەوە قسە بکەم، گرەو ئەکەین بە نیو سەعات کە ٣٠ دەقەیە، ٣٠ جار بۆت بنوسێ بەقوربانت بم. هههههە.

دڵنیا: هەستی پێ ئەکا زۆر زۆڵە، دوایی ئەزانێ قسەی خۆم نەبوو.

دەوران: ئەک زیرەکەی باشە؟ دەبڕۆ هەر بە گێلە گێلەکەی خۆتەوە بیهێنە سەر خەت.

شەنیا: جا توخوا ئەوە بەشەرە گوڵەباخ؟ ژنی هەیە ژن.. ئەگەر بێتە پێشەوەو پەیوەندییش دروستکا، ناوێرێ ژنەکەی تەڵاقبا، ماوەیەک خۆی دڵخۆش ئەکاو دواییش بە پەلەپیتکە لە خۆیت دوور ئەخاتەوەو ئەتتەکێنێ.. پێش ئەوەی تۆ مەرامەکەت بێتە دی.

دڵنیا: کەرە کەر.. بیبڕەوە.

دەوران: دڵنیا گیان دنیا وەک تۆ بەقورسیی ناگیرێ چاوەکەم، ئێستا ئەو ڕاماڵە کەرەی بۆ ئەم گوێ قوتە سوتاوە، پێم بڵێ بۆ هاوسەرگیریی یەکسەر ڕازیی ئەبم، ئەزانی بۆ؟ هەیەتی کچم هەیەتی، دنیا دنیای بەرژەوەندییە.

شەنیا: ئۆهـ خۆزگە پێی ئەوتی و ئەو گیزە گیزەت لە کۆڵ ئەکردمەوە.

دڵنیا(( سەر هەڵنابڕێ)): جا خۆ تۆ لە هیچت کەم نییە، بۆ دوای پارەکەی ئەکەوی؟ ئەوە بۆ شەنیا باشە، هیچ نەبێ خۆی پێ ئەگرێ.. ئەگەر مەسەلە بەرژەوەندییە؟

شەنیا: ئەگەر دەرگاوانی خەزێنەکە دێتەوە پێشەوە! ئەوسا ئەزانی من چاوەڕێی چیم؟

دەوران: خۆ ئیتر کەرێتییش دەست هەموو کەسێ ناکەوێ، بۆ نا؟ ڕەنگە دوای ئەو هەموو درۆیەشت هەر مەیلی بمێنێ.. بەعزێ کەس (( ئاماژەی دڵنیا ئەکا)) کەرێتیی پیس کەریان ئەکا.

شەنیا: من شتێکم بۆ نەکردووە نەگەڕێتەوە؟! لە بری خۆی ٤٠ هەزار دۆلارم بۆ داوە بە پاشاکەی باوکم.

دەوران: دەی لەوبەری تەرازووەکەشەوە یەک تەن درۆت بۆ هەڵچنیوە.. کامیان قورسترن.

شەنیا: ئەوە لە دڵنیا بپرسە خەریکی کوڕان گەوجکردنە.

(( دڵنیا مۆبایلەکەی هەڵئەدات و بە قیژەی بەرزو بە پەنجەی هەر دوو دەست لایک کردن، خۆشیی دەرئەبڕێ، شەنیاو دەوران دەمیان دائەچەقێنن))

دەوران: ئەوە چی بوو شرِشێت؟ وتی ئەتکەم بە ژنی دووەم؟ هەهە

شەنیا: نا ڕەنگە ژنەکەی تەڵاقدابێ.

دڵنیا: نا نا وتی تۆ دڵی منی بەساقەوبم .. ئای خوایە زۆر سوپاس.

شەنیا: دڵنیام پێمان ڕائەبوێرێ،(( بۆ دەوران)) وا سەیری مەکە زۆر ساختەچییە، سەرکزی دڵ وریایە.

دەوران: وەڵا من ڕۆژیی سەد کەڕەت بەقوربان و بەساقەم ئەبن، بەس من (( پێز لێدان)) هەر بە چۆنی و چاکیی ئەزانم.

نیگار (( دێتە ژوورەوە)): ئادەی ئەوانە کێن ڕۆژانە قوربانت ئەبن؟ جارێ ئەو قیژەیە چی بوو؟ دڵم داخورپا.

شەنیا: وەڵا نیگارخان هیچ نەبوو، پیاوێکی خێزاندار بەساقەی ئەو داماوە بوو.

دڵنیا(( بە پێوەیەو یەخەی خۆی بە هەردوو دەستی جووت ئەکاو قیت ئەوەستێ)) : بەڵێ من نیگار خان.

نیگار(( سوعبەت)): دەی تۆ پێش ئەو دووانەیتر داوەشێی، بەو هەمووو جوانییەتانەوە هیچتان پێ بە هیچ ناکرێ.. ئێستا ئارەزووم لێ بێ، بەخوا بەخوا ناهێڵم هەفتەیەک بخایەنێ هەموو شتێ تەواو ئەکەم.

دەوران: ئێ ئێ ئێ، بەخوا وا دیارە دایکم پێشمان کەوتبێ و کەپڵی خۆی مسۆگەر کردبێ هههه ئادەی دانی پیانێ نیگارە گوڵ.

نیگار: سوپرایزە، چۆن ئاوا ئەوترێ؟

شەنیا: هەی لە نیگارخان؟!!!

نیگار: هەی لەخۆت؟ بۆ من وەکو ئێوەم؟ هههه دەی هەستن، دەمێکە نازە کێکەکەو یەدارەکی ئاهەنگەکەی ئامادەکردووەو شیڤۆنەکەشی لێناوە، وا سارد ئەبێتەوە.

دەوران(( هەڵئەسێت ڕائەکات و پێشیان ئەکەوێ)): واو شیڤۆن و کێک و ئاهەنگ!!

(( چوونە دەرەوەی ئەوانیتریش)) ——————— Cut ———————

**(( ئەکرێ ئاهەنگێک بۆ عید میلادی دەوران ڕێک بخرێ و دوای ئاهەنگەکەش شیڤۆنەکە بخۆن، ئەو دیمەنەش ڕاستەوخۆ بە تابع و متبوع دابنرێ، لەبەر تسلسلي زمني، یان بخرێتە دوای دیمەنی ٨١١))**

دیمەنی – ٨١١ – ش/ن – ژووری پاشا:

(( خەلیل و ئاسۆو بەرامبەری پاشا وەستاون، کە تەنها هەر لایەکی سەری دیاره))

خەلیل: پاشا گیان مادام ئوتێلە، زۆر بێخەمترە، لەسەر ئیزنی جەنابت، دوو سبەی عومەرو بەیار ڕائەسپێرم پێش خۆمان بچنە ئەوێ و وا بکەن بکەونە پشت سمکۆو قەوم و قیلەکەیەوە، لەگەڵ ئیشارەتی خۆتا سمکۆ بکوژن ئەگەر پێویستی کرد.

پاشا: وتی دووان ئەهێنم لەگەڵ خۆما، تۆبڵێ چواریش بێنێ و ئێوەش چوار کەس بن، چارەسەر ئەکرێ، بەڵام ئیتر وریایی زیاد لە پێویستم ئەوێ، وابێ بتوانم مەرجی بەسەرا بسەپێنم.. هێز هەموو شتێک ئەگۆڕێ.

ئاسۆ: منیش برایەکی شەڕانیم هەیە، ئەگەر ئیزن بفەرمووی لەگەڵ خۆم ئەیهێنم.. تا زۆر بین باشترە.

پاشا: جا خۆ پەکمان لەسەر کەس نەکەوتووە ئاسۆ؟! هەر ئێستا کۆیان بکەمە، پانزە بۆ بیست چەکدار دێنە ئەو شوێنەی بمانەوێ، بەڵام برا باشترە، لە تەنگانەیا خۆی لەسەرت بەکوشت ئەدا، با ئەویش بێت، ئیتر بەسە، ئوتێلە، قەرەباڵغیی ناکرێت، ئەویش ناتوانی خەڵکی زۆر لەگەڵ خۆیا بێنێ.

ئاسۆ: فەرمانتە پاشاگیان.

پاشا: خەلیل تۆش بە جەوهەر بڵێ، خۆی و ئەو دوو سێ چەکدارەی لایەتی، با دوور بەدوور چاودێریی ئوتێلەکە بکەن و هەر لە سەیارەکەیاندا بن، نەهێڵن چۆلەکەیەکیش لەو ئوتێلە دەربازی بێ گەر شتێک ڕوویدا.

خەلیل: فەرمانتە پاشای گەورە.

پاشا: یەک دوو گرووپی تریش هەن، خۆم ئاگاداریان ئەکەمەوە.. باوەڕ ناکەم هیچیش ڕووبدا، تەنها ئەوەندە هەیە، کابرا زۆر کەرترە، ئەترسم هەڵەیەک بکات و لێی قبوڵ نەکەم، ئەگینا هەر زۆر ورد ئیشمان لەسەری کردووە.

Cut

دیمەنی – ٨١٢ – ش/د – ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس و ئاکۆو نینا دانیشتوون.. لە دەرگا ئەدرێت و نینا ئەیکاتەوە.. عەقید بەهێزو دوو پۆلیس، بە جلی مەدەنییەوە لە دەرگاوە ))

بەهێز: ماڵی کاک ئاکۆیە؟

نینا: بەڵێ فەرموون.

بەهێز: زەحمەت نەبێ پێی بڵێ عەقید بەهێز هاتووە لە پۆلیسی گشتییەوە.

نینا: فەرموو فەرموو کاک عەقید.

(( هاتنە ژوورەوەو سڵاو و دانیشتن و یەکتر ناسینەوە))

بەهێز: پێویستیمان بە هاوکاری جەنابتانە بۆ دوو سبەی.

ئاکۆ: لە خزمەتتانداین هەرچی بە ئێمە بکرێ.

بەهێز: بەپێی زانیاریی ئێمە ئێوە ماڵێکی باشن و هیچ خوانەخواست نیشانەیەکی خراپتان لەسەر نییە، ئەوە بوو، بوون بە قوربانیی خەڵکی چاوچنۆک و تاوانباریش.. پارەیەکی زۆرتان لێدزراو ئەنجامێکیشمان دەست نەکەوت..

ئاکۆ: خوا هەڵناگرێ ئێوەش باش ماندوو بوون بەو وەزعەوە.

بەهێز: ئەوە ئەرکی خۆمانە قوربان.. (( بۆ گێلاس)) ئەگەر دوو سبەی هاوکارمان بن، خۆت و ئەو کچەی لەگەڵتا کار ئەکات، ئەوی ماڵەکەی بەرامبەرتان، لە ئۆفیسەکە نەجوڵێن تا دەوامی خۆتان تەواو ئەبێ و ئەوکاتە وەک ڕۆژانیتر بڕۆنەوە، مەبەستم ئەوەیە مەیەنە ئوتێلەکەوەو هەر لە شەوەکییشەوە کوڕەکەت بگەڕێنەوە، بەوە یارمەتی یاساو دادپەروەریی ئەدەن.

ئاکۆ: بۆ شتێک هەیە جەنابی ئەفسەر؟

بەهێز: ئێمە متمانەی تەواومان پێکردوون و ئەو شوێنەی ئێوەمان هەڵبژاردووە، بۆ دەسگیرکردنی تاوانبارێکی گەورە، ئەگەری ئەوەش هەیە، پارەی خۆتان پێ بگاتەوە.

گێلاس(( دەربڕینی خۆشیی زۆر)): ئەک لێت بەزیاد بێ خوایە گیان!

بەهێز: تکایە بە هێمنیی.. ئەم نهێنییە تایبەت بە ئێوە وتراوە، لەبەرئەوەی پێشتر لێکۆڵینەوەی زۆرتان لەسەر کراوەو ئەزانین خێزانێکی نیشتمانپەروەرن.. بۆیە داواتان لێ ئەکەم پیپارێزن و نەیدرکێنن.

ئاکۆ: زۆر بێخەمبە جەنابی ئەفسەر، ئەوە کاری دەوڵەتەو بە ئێمە سپێرراوە، چۆن ئەیدرکێنین، خوا ئەکا هەر تاوانبارێک ئەگیرێ، بۆ ئێمە جێی خۆشحاڵییە، گەر دزەکەی ئێمەش نەبێت.. ئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو هاووڵاتییەکە.

بەهێز: داوای لێبوردن ئەکەم ئەوەش بڵێم لە سبەینێوە هیچ میوانێک وەرمەگرن و میوانە هەمیشەییەکانیش بۆ دوو ڕۆژ ئیزنبەن.. لە سبەینێوە، کارمەندەکانی ئێمە بە جلوبەرگی جۆراوجۆرەوە ئەبنە میوانی ئوتێلەکەو پارەی خۆشیان ئەدەن.......

گێلاس: سبەی پارە لە یەک کەس وەرناگرم دڵنیابە، تەنها ئەوە بکەن شتێکیان پێ بێ بیانناسمەوە بۆ ئەوەی وەریانگرم.. دوو سبەیش چۆڵی ئەکەین.

بەهێز (( لە گیرفانیا لەتی وێنەیەک دەرئەهێنێ و ئەیداتێ)): هەرکەس تەواوکەری ئەم وێنەیەی پێ نیشاندایت، ئەوە کارمەندی ئێمەیە.. سوپاس بۆ هاوکارییەکانتان.. خۆتان ئەزانن چۆڵ کردنەکەی بۆ پاراستنی گیان و سەلامەتیی ئێوەیە.

گێلاس: ئەی گارسۆن و ستافی چێشتخانە چی لێ بکەین؟

بەهێز: ئەو ڕۆژە کە چووین، لە پرێکا هەموویان ڕائەگرین تا تەواو ئەبین، ئەیانخەینە یەک دوو ژوورەوە.. فەرمانی دادوەرمان لەسەر هەموو جوڵەیەک وەرگرتووە.. هیچ شتێک بێ پرسی ئەو ناکرێ، دڵنیابن.

گێلاس: کەمێکیتریش تێل بۆ ئەو کوڕە ئەکەم کە خواردنی ڕۆژانە ئەهێنێ و ئەویش چارەسەر ئەکەم، کە نەیهێنێ.

ـــــــ تەواوکراوی تابعی هەیە ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــ

دیمەنی – ٨١٣ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ئامۆ، سەرسوچی بەردەرگا:

(( ئامۆو ئاوا بە سەیارەی ئاوا ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.. سەیارە خصوصیەکەی بەهێز لەبەر دەرگای ماڵی ئاکۆ وەستاوە، دوو کەس لەبەردەرگا بە جلی مادەنییەوە وەستاون))

ئامۆ: ئەوە چییە ئەڵێی هێشتا تەعزێ نەبڕاوەتەوە؟ دیارە شتی گەورە لە ماڵیانە، پاسەوانی هەیە.

ئاوا: کەیفی خۆیانە، یاڵڵای ئەکرد دە مانگی تریش بەردەوام ئەبوو، ئەچینە ژوورەوە، نەک بێنە دەرەوە، حەزم بە بینی نینا نییە، زۆر ڕەزای تاڵ بووە لەلام.

ئامۆ: دەی داماوە دوو تەعزێی هەیە، هەرچۆنێک بێ ناهەقی نییە.

ئاوا: من ئەچمە ژوورەوە، تۆ کەیفی خۆتە.. سەیریانککە.. تۆ دامگرە!

ئامۆ: جا من بۆچیمە؟ خۆ خەوی لە من نەزڕاندبوو خاڵە، خەوی لە تۆ زڕاندبوو.

ئاوا: باسی مەکەرەوە تەواو.

ئامۆ: ئەوە هاتنە دەرەوە.

(( ئەگەنە بەر دەرگاو پێش ئەوەی دابەزن، عەقید بەهێز و ماڵی گێلاس دێنە دەرەوە ئەوسا ئاواو ئامۆ دائەبەزن ))

ئامۆ: ئەوە عەقید بەهێز نییە؟

ئاوا(( سەرنج)): بۆ ئەو نییە؟ دیارە خزمیانە!

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٨١٤ – متبوع و تەواوکاری متبوع بۆ دیمەنی – ٨١٢ – ش/ د – بەردەرگای ماڵی ئاکۆ:

(( بەهێزو دوو پۆلیسەکە ئەڕۆن و ئاکۆو گێلاس خواحافیزییان ئەکەن و سوپاسگوزاریی بەهێز.. نینا نایەتە دەرەوە.. سەیارەکەی ئامۆو ئاوا وەستاوەو دائەبەزن.. ئامۆو ئاوا سەلامیان لێ ئەکەن و ئاوا لەبەر دەرگایە بچێتە ژوورەوە ))

Cut

دیمەنی – ٨١٥ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن لە ژوورەوە دەنگی دێت و نیزام لە دەرەوە))

نیزام: زۆر سوپاس، ناتوانم پەلەمە، هەر هاتم بیرت بخەمەوە نیوەڕۆ دەعوەتی، وتم نەک بیرت چووبێتەوە. (( ئەردەڵان بەوێدا تێپەڕ ئەبێ و ئەچێ بۆ چاخانەکە))

نارەوەن(( دێتە دەرەوە)): نا نا کەس هەیە دەعوەتی برای خۆی بیرچێتەوە؟ بە تەلەفون پێم بڵێ و خۆم دێم بۆ ئەو شوێنە.

نیزام: ئەی نەیەم بە شوێنتا؟

نارەوەن: نا پێویست ناکا زۆر سوپاس، عەزێت مەکێشە.. خۆم دێم.

نیزام: دەی کەواتە جارێ بە یارمەتی خۆت.. خواحافیز.

(( نارەوەن ئەچێتە ژوورەوەو ئەردەڵان دانیشتووەو چەند کەسێک نان و چا ئەخۆن))

Cut

دیمەنی – ٨١٦ – ڕ/ د – بەر ئۆفیسی گێلاس:

(( ٣ کەس بە جلی مەدەنییەوە چاودێریی سەرچڵ ئەکەن کە نزیکی ئۆفیسی گێلاس بە خاویی ئەڕوات))

کەسی ١ : باش چاودێریی بکە، سەرنجی ناو ئۆفیسەکە ئەدات.. لەوانەیە مەبەستێکی هەبێت.. غافڵی نەکەی.

کەس ٢: وا چاوەڕوانین بزانین بە کوێ ئەگا؟

(( سەرچڵ ئۆفیسەکە تێ ئەپەڕێنێت و ئەڕوا))

کەسی٣: هەر سەرەتاتکێ و ملەقوتێ بوو.. هیچ نییە.

کەسی ١: هەرزەکارەو کچی بینیوە هههههه.

(( مانەوەی هەرسێکیان لەو شوێنە))

Cut

دیمەنی – ٨١٧ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و هەندرێنی لێیە.. ڕەوەز پەیا ئەبێ.. ڕەوەز کوڕێکی سەرسەریی بە پانتۆڵ و کراسەوە، هێمن خۆی دەرئەخا.. باریکەلەیەکی بالا کەمێک بەرز، تەمەنی نزیکەی ٣٢- ٣٥ ساڵێک.. کەمدوو دەرئەکەوێ، چایەکی لەبەردەمدایە))

ڕەوەز: ئەڵێن کۆمپانیای کاک ئاوا لێرەیە؟

هەندرێن: ئیشت پێیەتی؟

ڕەوەز: هاوڕێی منالیی و تەلەبایەتیمە.

هەندرێن: ئەهاا خۆشحاڵم بەخێر بێی، بەڵێ ئەوەتا لەوبەرەوە، بەلام وابزانم چۆتە ژوورەوە بۆلای دایکی لەو ئۆفیسە ئەگەر ئەچی؟

ڕەوەز: وا زوو دێتە دەرەوە یان هەر لەوێ ئەبێ؟

هەندرێن: نا زۆری پێ ناچێ کۆمپانیاکەی خۆی لەوبەرەوەیە.. (( ئاوا لە ئۆفیسی وەکالەت دێتە دەرەوەو نارەوەنیش بەدوایدا دەرگا دائەخات و ئەچێت بۆ سەیارەکەی)) ئەوە هاتە دەرەوە.. کاک ئاوا کاک ئاوا.. ئەم برادەرە بۆ لای تۆ هاتووە.

ئاوا(( دێتە لایان و کەمێک لە ڕەوەز ورد ئەبێتەوە)): ئۆوا! بۆ نالێی من حەمە تاک عەیارەم هەههە؟

ڕەوەز: ئەو ناو و ناتۆرەیەم دەمێکە لەسەر هەڵگیراوە، ئەوە چۆن بیرت کەوتەوە.. من ڕەوەزم ئاواگیان.

(( باوەش بە یەکا کردن و هەواڵپرسین و خۆشحالیی))

ئاوا: تۆ جارێ با بچینە لای خۆم، ئەوسا تێر قسەش ئەکەین.

(( ئاوا ڕەوەز پێش خۆی ئەدات و ئەچنە ئەوبەری جادەکە بۆ کۆمپانیاکەی خۆی))

Cut

دیمەنی – ٨١٨ – ڕ/ن – چێشخانەیەکی ڕاقی:

(( نارەوەن و نیزام ماسییان لەبەردەستتدایە))

نارەوەن: ئەی چۆن؟ خزمایەتی هەر لە ژن و ژنخوازییەوە دروست ئەبێ.

نیزام: بەڕای تۆ ئەوان پێک ئەگەن؟

نارەوەن: کە هیچ نەدرکێنێ، چوزانم؟ ئیتر ئەوە تەبیعەتەکەیەیی کاک نیزام، ئەگەر شتێک نەیەوێ وەڵامباتەوە، هەر نەرمە پێکەنینێک ئەکات و ئەڵێ، ئا ئا هیچ نییە، یەکسەر ئەو ژوورەش جێ ئەهێڵێ، ئەمشەو چوار جار دوای کەوتووم لەو وەڵامە زیاترم دەست نەکەوت، هیچ نییەو بەس.. ئەی کچەکە ئەڵێ چی؟

نیزام: ئەمشەو لە ماڵی ئەو کچەی هاوڕێی مایەوە، نەمبینی.

نارەوەن: دەی بۆ سبەی ئیشەڵڵا.. سبەینێ تۆ دەعوەتی من ئەبی.

نیزام: زۆر بە خۆشحاڵییەوە، من سەرم پێوە نییە. هههە.

نارەوەن: هەر شوێنێکت پێخۆشە دیاری بکەو لە خزمەتتا بم.

نیزام: ئەکرێ ئێوارەکەی بێت؟

نارەوەن(( هەڵوێستەو چاو زیتکردنەوە)): نا، من کەس بۆ ئێواران لە دەرەوە دەعوەت ناکەم و دەعوەتی کەسیش بۆ ئێواران لە دەرەوە قبوڵ ناکەم.

نیزام: ببورە، گەر ئەم بابەتە سەری گرت، ئەوا بە شەنیا ئەڵێین ئێوارەیەک شتێکمان بۆ ئامادە بکا.. دەی ئەوە ڕێک ئەکەوین کێشە نییە.

نارەوەن: تۆ باسی ئیشێکت کرد کە داهاتی زۆرەو واو وا، ئیتر بەهارت هێنایە ئەژنۆ.

چی بوو تەواوت نەکرد!

نیزام: ڕاستیەکەی ئیشەکە هەیە، بەڵام پارەیەکی خەیاڵیی ئەوێ بۆ دەسکەوتنی چەندین قاتی خۆی.

نارەوەن: مەبەستت ئەو شتە نەبێ مێردەکەمی لەسەر عیدامکرا؟

نیزام: ڕێک ئەوەیە، بەڵام ئەگەر تۆ حەزت لێ بێ، ئەتوانین وریایانەتر مامەڵە بکەین و قەت نەگیرێین.. ئەوان هەڵەکەیان ئەوە بوو، هەموو شتێکیان خستبووە بەردەستی ئەفسەرێک، بێ ئەوەی بە وردیی چاودێرییان کردبێ، ئەویش هەر بە کڵاو گرتنی، گرتنەکەیان هیچ زەحمەت نەبوو.

نارەوەن: ڕاست بڵێم، کێشەی پارەم نییە، ئەوە هەیە خوا نەیبڕێ.. باشە ئەی تۆ چۆن یەکسەر ئەو باسەت لای من کردەوە؟ لەوە ناترسی منیش شتێک بم؟

نیزام: نا خێزانی دارەوانی ڕەحمەتی ناپاکیی لەگەڵ ئێمەیا ناکەن، من ئەزانم هەمووتان ئەو ئیشەتان لا مەبەستە.

نارەوەن: تا ئێستا بیرم لێ نەکردۆتەوە کاک نیزام.. زۆر ئەترسام دەستی بدەمێ و بەدەردەکەی دارەوانی ڕەحمەتیچم.

نیزام: خۆم ئەتپارێزم و پاسەوانی دنیات بۆ دائەنێم، وەک دارەوان ئەتکەم بە پاشا، وتت چی؟

نارەوەن: نازانم، بەڕاستی بیرت ئاڵۆز کردم.

نیزام: ئەزانی ئەگەر یەکجاریش ئەوە بکەین، ئەبین بە خاوەنی چی؟ بەڵام بە بڕی گەورە.

نارەوەن: خۆ منیش شکم لەسەر نییە.. بەس ئێستا من ئەترسم تۆ پۆلیس بیت.

نیزام: حەز ناکەم سڵم لێ بکەیتەوە، من لای خۆمەوە خۆم بە خەزوری کوڕەکەت ئەزانم، چۆن ناپاکیت لەگەڵ ئەکەم.. با ئەمجارەیان خۆم و خۆت خەڵک بکەینە خزمەتکاری خۆمان و هێز پەیاکەین و ببین بە پاشا.. بابە تۆ پاشا بەو من بەردەستیت ئەکەم.

نارەوەن: ئەستەغفیرەڵڵا کاک نیزام، من حەددی ئەوەم نییە.. بەس بەخوا پێویستیم بە بیرکردنەوەی زۆرە، ئەو ئیشە زۆر مەترسیدارە.

نیزام: خەمت نەبێ هەمووی لەسەر خۆم، وا بەرنامەی بۆ دائەڕێژم، هەتا دنیا دنیا بێ حکومەت بۆمان بگەڕێت نەماندۆزێتەوە.

نارەوەن: باشە خۆ من تلیاکم نەدیووە، چۆن بازرگانیی پێوە بکەم؟

نیزام: سبەی نمونەیەکت بۆ ئەهێنم ببینی و وردەوردەش بەکاری بێنە، ئەوسا ئەبینی ئەم دنیایە چییە.. بۆ وا ڕەق و تەقە؟.. ئەسڵەن شەپۆل ئەدا لە جوانییا، بەس وا هەرگیز نایبینی.. من کە ئەیکێشم ئەبمەوە بە کوڕی چواردە ساڵ، هەر مەپرسە جیهانیش چەند جوان هەڵئەگەڕێ و چۆن خۆیم بۆ نمایش ئەکا.

نارەوەن(( گەمژانە)): ئەوە بە ڕاستتە؟

نیزام: تۆ بوەستە تا بەیانی بۆت ئەهێنم و پێت ئەڵێم چۆنی بەکار بێنی.. ئەوسا دێیتەوەو ئەڵێی نیزام با دەست پێ بکەین.

نارەوەن: جا وەک تۆ باسی ئەکەی یەڵڵا نیزام با دەست پێ بکەین. هههه.

نیزام: کچێ بەساقەوبم و لە دەوری سەرتگەڕێم.. خۆم ئەمزانی چەندە وشیاری.. ژنێ ژنی دارەوان بووبێ، چۆن ئیشی وا ڕات ئەکاتەوە.

نارەوەن: دەی بەخوا یەکجار دارەوەن باسی کردووە، ئەویش بۆ کوڕەکان، وتی پیسە نەچن بەلایە هەموو ئێسقانی گیانتان شی ئەکاتەوە.

نیزام: ئەو ناپاکیی لێکردوون و ڕاستیەکەی لێ شاردونەتەوە.. بەڵام من ئەو ناپاکییەت لەگەڵ ناکەم.

نارەوەن: من قوربانت بم کاکە نیزام.

نیزام: ئەو کاکەو دادەیەش هەڵگرە، تازە هەردووکمان ئەبین بە بەنگکێش و بەنگفرۆش.. ئەبین بە گەورەترین بازرگانی ئەم وڵاتە.

(( پێکەنین و نانخواردن))

Cut

دیمەنی – ٨١٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو ڕەوەز))

ئاوا(( پێکەنین)): بەڵام باوەڕکە ئەوەیان من نەبووم.. ئەوە سمە لەگۆڕ یاخی بوو.. دوایی وتی کەزانیم حمە تاک عەیارە پشتە سەری ئەخورێنێ، وتم فرسەتەو تەباشیرەکەم گرتە سەری مامۆستا، کە مامۆستا ئاوڕی دایەوە، حمە تاک عەیارەی بینی دەستی دائەگرێ و وایزانی ئەوە.. ئیتر ئەوە بوو مامۆستا تۆی بەر شەق و زللەدا.

ڕەوەز: کەستان درێغیتان لێ نەکردم.. من گەردنی هەمووتانم ئازاد کردووە.

ئاوا: زۆر کەمدووش بوویت ڕەوەز، جاران فریای بەڵێیەکیش نەئەکەوتین لەگەڵتا.

ڕەوەز: ئیتر ژیان فێرمان ئەکا.

ئاوا: ئەی ئیش و کارت.. باوەڕکە بە دڵ حەز ئەکە لە نزیکی منەوە ئیشێک بکەی.. با هەر ئاگامان لە یەکتر بێ برا.

Cut

دیمەنی – ٨٢٠ – ئێوارە / د – ناو سەیارەی دەوران:

(( شەنیا لە سەکن دانیشتووەو دەوران شۆفێرە))

دەوران: سیسکۆس خۆ من تۆ نیم هەر درۆ بزانم، بە چاوی تۆ دایکم خۆی وتی.

شەنیا: یەعنی وتی ئەگەر بێتاقەتە با بێتە لای من؟

دەوران: ئێی جا چەندجاری بڵێمەوە؟

شەنیا: لەو کاتەوەی ناچمە لای ئامۆ، هەم بێتاقەتم و هەم ناشزانم بچم بۆ کوێ، هەموو شوێنەکان دووبارەن، سەرودڵم ئەگرن.

دەوران: گاڵتەشت بە دڵنیا ئەکرد، ها؟

شەنیا: بۆ ئەمەیە عەشق؟

دەوران: ئەی ئەوەنییە لە پەل و پۆی خستووی؟ هەهە

شەنیا (( بەڕابوردنەوە)): گاڵتە؟ هەهەهە

دەوران: بچۆ لای دایکم خۆت خەریککە، با ئەم تەپوتۆزی عیشقەت بۆ بتەکێنێ و بتکا بە کەسێکی ڕیاڵیی.

شەنیا: نا من باڕسەییم هەهەهە.

دەوران: دەبەنگ مەبەستم ڕیاڵ و بارسا نییە، مەبەستم لە ڕیاڵیی واقیعیە واقیعی.

شەنیا: جا بۆ بەو تۆخییە واقییعی؟ واقعی و تەواو.

دەوران: دە توخوا دەمت داخە.

شەنیا: با مانگانەم لای تۆ بێ، لە ڕووم نایەت لە دایکتی وەرگرم.

دەوران: هاهاها خۆ لە کارگەکەی من نابیت، ئەگەر دێیتە لای من سبەی وەرە بۆ ئیش.

شەنیا: کە چووینەوە بەدایکت بڵێ توخوا (( سیدیی گۆرانییەکی ئەجنەبی، یان لۆتیەکی ئەخاتە سەر بە دەنگی بەرزو چەقەنە لێدان بە دەمییەوە، پاش کەمێک))

دەوران(( بەدەنگی بەرز)): تەلەفونە تەلەفۆن.. فۆن فۆن.

شەنیا((سەیرێکی مۆبایلەکەی ئەکا)): کەرە عاشقەکەیە.. ها بۆ تۆ، تۆ حەزت لێیەتی.

(( هەر گۆرانیی و کەس وەڵامی تەلەفونەکە ناداتەوە))

Cut

دیمەنی – ٨٢١ – ش/د – ناو سەیارەی نیزام:

(( نیزام و هەڵشۆ))

هەڵشۆ: من لە ڕایی خوایا پێت ئەڵێم، دوایی نەڵێی کە شتێکت ئەزانی بۆ پێت نەوتم.

نیزام: بۆ پاشا حمەخدرەکەی کوشتووە؟

هەڵشۆ: نەیکوشتووە، بەڵام بەقوربانی کوشتنی کردووە.

نیزام: دە توخوا تێمگەیەنە بە ڕوونیی.

هەڵشۆ: کاکە ئەوەندەی بزانم پاشا ئەیەوێ سامانی ئەو ماڵە هەمووی بۆ خۆی ڕامالێ.. ئەو خدرە لێیان نزیککەوتەوە، بە چوار فیشەک کە هیچیشی بەرنەکەوت، وای لێکرد، باوەڕ ناکەم خۆیشی بزانێ ئێستا لە کوێیە.

نیزام: بەڵام پاشا خۆی پێیوتووم کە لێی نزیک ببمەوەو سەرەباسی تلیاکیشی لەگەڵا بکەمەوە.

هەڵشۆ: قسەکەت تەواوە، بەڵام گەر تۆزێ تەماع بتگرێ و بتەوێ جگە لەوەی پاشا ئەتداتێ شتێکیتریشت دەستکەوێ، ئەوا سەری خۆت دائەنێیت و عەننابی نابێ، چونکە تۆو خدر جیاوازن.. ئەگەر بەو فیشەکانە دوور نەکەوتایەتەوە، دڵنیابە ئێستا کفنیشی زەرد کردبوو.

نیزام: جا وەک باسی ئەکەی، دەستت بە پەڵەی هەورەوە بگرتایە حوکمەت بە ئیشی تۆی ئەزانی، چونکە ئەوەندەت ڕق لێی بووە.

هەڵشۆ: جا خۆ هەر لەبەرئەوە بوو خۆم دەستم تێی نەئەچوو، چونکە هەموو کەسێ ئەزانێ چەند بە خوێنی سەری تینوو بووم.. جا من خەمی پاشام بوو ئەو دەستی تێی نەچێ.

نیزام: بەخوا دڵنیام لە ترسی ئەوە لە پاشاش پاڕاویتەوە، فیشەک بەر خۆی و سەیارەی نەکەوێ کە مشورخۆری؟! باش فریای خۆت ئەکەوی. ______ Cut ______

دیمەنی – ٨٢٢ – ش/د – باخی ماڵی ئاکۆ:

(( نینا سەرقاڵی مۆبایلەو گێلاس و ئاکۆش دانیشتوون))

گێلاس: تۆ بچۆ لای دیارگیانبەو لەوێ بخەوە، تا ئەوان دێن و شوێنەکە وەرئەگرن.. بەخوا من ئەمڕۆ مردم ئەوەندە پۆلیسم بە میوان وەرگرت لەوێ.

ئاکۆ: بۆ خۆت چوویتە پرسگەکە؟

گێلاس: ئەی چیت بۆ باس ئەکەم؟ یان خەیاڵت لای من نییە؟! .. وتم دیار مناڵە با ئەو باسانە نەزانێ.

ئاکۆ: ئەی ئێستا ناڵێ بۆ پرسگە ئەدەن بەو کابرایە.

گێلاس: بەرەوەڵڵا ڕاست ئەکەی.. دە کەواتە بچۆو بینێرەوە هەر خۆت لەوێ بە تا ئەیدەیتە ئەوان.

ئاکۆ: ئەمەیان باشترە، ئەچم خۆم ئەگۆڕم و ئەڕۆم.

گێلاس(( بۆ نینا )): ئەوە تۆ خەریکی چیت ماڵەکەم، ملت نایەشێ ئەوەندە سەر شۆڕ ئەکەیتەوە بەسەر ئەم مۆبایلەیا؟

نینا: نا پورێ گیان یاری ئەکەم، باش مەشغوڵی کردووم.

گێلاس: هەر ئاگات لە ملت بێ کچم، جاروبارێکیش بەرزی بکەوە.

(( نینا سەر بەرز ئەکاتەوەو خەندە))

Cut

دیمەنی – ٨٢٣ – ش/ د – باخەکەی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن تێل ئەکا ))

نارەوەن: ئەها؟.. گومان ئەکەی نەیهێنێ؟

ڕاهۆز(( دەنگ)): دڵنیاشم نایهێنێ، چونکە وا بە خێرایی متمانەت پێ ناکەن.. تۆ هەوڵ بدە بە مۆبایلەکەت، هەموو دانیشتنەکە ڕیکۆرد بکەی.. دوو سێیەکیشت لەوێ بۆ دائەنێم، ئەگەر هێنابووی شلەیەک ماستاوێ ساردییەک بڕێژە بە جلەکانتاو داوای گارسۆن بکە بە هاناتەوە بێت و بە دەنگی بەرز بڵێ شتم پیا ڕژاوە.. هەر ئەو دەقەیە دێن و قۆڵبەستی ئەکەن.

نارەوەن: توخوا کاک ڕاهۆز تۆزێ زوو فریامکەون، زۆر بێ چاو و ڕووە، دێتە ناوچاوی بەشەرەوە.. هەر زمانم بەیاکا دێ، نازانم چی بکەم؟..

ڕاهۆز: خەمت نەبێ لەوێین.

نارەوەن: باشە ئەگەر نەیهێنا بوو، ئەوا زوو خۆم عاجز ئەکەم و دەرفەتی نادەمێ، کە هێنابووی ئیتر ئەوەیان وەک جەنابت ئەیلێی لەسەر خۆتانە.

ڕاهۆز: سەرچاو نارەوەن خان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین.. بەڵام بیرت نەچێ ئەوەی ئەمڕۆم هەموو بە ئیمۆکە بۆ بنوسەو بۆم بنێرە.

نارەوەن: ئەی بە تۆماری دەنگیی نابێت؟ بەخوا نوسینی زۆر زۆرە.

ڕاهۆز: باشە بە ڤیدیۆیی بۆم بنێرە.. دەی جارێ خوات لەگەڵ.. وریابە.

نارەوەن: خەمت نەبێ خوات لەگەڵ. (( بانگی تیرۆژ ئەکا بە ئاراستەی ژوورەوە، بە دەنگی بەرز)) تیرۆژ، تیرۆژ.

Cut

دیمەنی – ٨٢٤ – ڕ / ن – ناو ئوتێلەکەی گێلاس:

Mute

(( چەند کەسێک لە جنسیاتی جیاواز وەک شێوە عەرەب و عەگال و شێوە ئەورووپیی و شێوە کوردی ڕۆژهەڵات و بەغایی لەگەڵ دوو ژنی موحەجەبە ڕەش.. بە جۆرێک کەس گومانی ئەوەیان لێ نەکات سەر بە پۆلیسن.. دوو کوڕی گەنج بە کراسی سپیی و بۆینباخی بچوکی سوورەوە لە پرسگەن و چەند گارسۆنێکیش بەوجۆرە..))

Cut

دیمەنی – ٨٢٥ – ڕ/ د – نزیکی ئۆفیس و ئوتێلی گێلاس:

(( خدر٣ و دووان لە خزمانی، لە سەیارەیەک دائەبەزن و هەرسێکیان بە باڵ ڕاوەشاندنەوە ئەیانەوێ بەرەو ئوتێلەکە بچن..........

# (( ئەڵقەی چل))

مناڵێک بە ڕاکردن دێت و بانگی خدر٣ ئەکا))

مناڵ: خاڵە خاڵە!

خدر٣: ها خاڵە گیان.

مناڵ(( نامەیەکی بە دەستەوەیەو ئەیدا بە خدر٣)) : خاڵە ئەو سەیارەیە (( چاو ئەگێڕێ)) کوا؟ ڕۆشتووە.. ئەمەی دامێ وتی بیدە بەو پیاوە بڵێ نامەی خۆیەتی.

خدر٣: باشە باوکەکەم سوپاس.

(( نامەکە ئەکاتەوەو گەر مەبەست بوو نیشان بدرێ نوسراوە: ئەو ئوتێلە پڕە لە پۆلیس، بە پەلە دەرچن لەوناوە مەمێنن، دیارە مۆبایلەکەت چاودێریی ئەکرێ، خۆت لە دەست مۆبایلەکەت ڕزگارکە.. پەیوەندیت پێوە ئەکەم، بە ڕێگەیتر))

خدر٣: ڕاکەن بۆ ناو سەیارەکان، جەماعەتی پاشا لەمناوەن و چاودێریمان ئەکەن.. خێرا !!!!!

(( زۆر بە خێرایی و نیمچە ڕاکردن بەرەو سەیارەکەیان ئەچن و دەرئەچن))

Cut

دیمەنی – ٨٢٦ – ڕ/ د – گوندی دیدەوان:

(( تەیفورو دیدەوان بە ناو ماڵانەوە، لە سەرووی دێوە دێنە خوارەوە))

تەیفور: جا وەڵا ئەگەر حەزت لێیەتی ماموٚستا؟ مردوو لەوە پاکتر ناشۆرێ، ئەویش بەدوای پیاوێکی سەنگین و گرانی وەک جەنابتا ئەگەڕێ شووی پێ بکا.. بنەماڵەو خانەوادەشی هەر زۆر نەجیبزادەن.

دیدەوان: نەء مام تەیفور خۆ من داواکردنی وام نەوت.. هەر ئەوە بوو زۆر گورج و گۆڵ هاتە بەرچاوم.. بێ ژنیی لە هیچی پەک نەخستووم تا بەدوایا وێڵ بم، ڕەنگە هەر بیریشی لێ نەکەمەوە.

تەیفور: هەڵبژاردەکەت زۆر باشە ئەگەر نیازیشت بوو، قەیچێکا، دەست نانێن بەڕوومانەوە.

دیدەوان: کاتی نییە مام تەیفور گیان، ئەو باسە هەڵئەگرین بۆ کاتی خۆی.. (( یەک دوو کچ و ژن ئەبینێ لەسەر تەنورێک خەریکی نان کردنن)) ئەرێ ئاساییە بچینە سەر ئەو تەنورە داوای نانێکی مادەیان لێ بکەین؟

تەیفور: ئەرێ وەڵا هەر زۆر زۆریش، ئەوە پرشنگی پورزامەو هەرچیت بوێ لە خزمەتداین.

دیدەوان: دەی کە وای لێهات، بە یادی منالیمەوە، کە دایکم مارمارۆکەی بۆ ئەکردم، داوای ئەوەش ئەکەم.. لەو کاتەوە بەردەستم نەکەوتووە، ئای کە ڕێککەوتێکی باش بوو.

تەیفور(( کە نزیکی تەنورەکەیە، پێش دیدەوان ئەکەوێت و ڕێنمایی ئەکا بۆ سەر تەنورەکە)): فەرموو ماموٚستا فەرموو.

(( سڵاو و وەڵام و ئەکرێ لە میوتیدا، یان بە دایالۆگی ئاسایی داوای مارمارۆکەو کەلانەو نانی مایە بکا))

Cut

دیمەنی – ٨٢٧ – ڕ/ ن – ئۆفیسی نیگار لە ناو کارگەیەکی ئاسنگەریی و ئەلەمنیۆمدا:

(( نیگارو ڕەمزی تەماشای نەخشەیەک ئەکەن.. شەنیاش لەسەر قەنەفەیەک دانیشتووە))

نیگار: ئەوەندەی محاجەرەیە، ئەوەش جامخانەو بۆکسی دەرمانخانەو پەنجەرەی بچوک و کورسیی درێژو لای نێوانکردنی ژوور.. ئەوەش سویچ پەناڵەکە.. ڕوونە وانا؟

ڕەمزی: ئەوە زۆر ڕوونە هەر کەسێک ببینێ ئەتوانێ سەرپەرشتیکا، کرێکارێک ئەنێرم، من لەبەر ئیشی باڵەخانەو مەلەوانگەکەی کاک ئارام فریا ناکەوم.

نیگار(( ئاماژەی شەنیا ئەکا)): بەم کچە ئەکرێ، ببێ بە یەکەم ئیشی؟

ڕەمزی(( بۆ شەنیا)): لە پێوانەسازییا چۆنیت؟

شەنیا: لە ژماردنا بە هەموو دوورایییەکانیەوە زۆر باشم.. (( خەندە)) پێوانەش ئەگرێتەوە.

نیگار: دەی کەواتە ئەو نەخۆشخانەیە وەرگرە، سەرپەرشتی وەستاکانی ئەلەمنیۆم و ئاسنگەرەکان بکە.

شەنیا(( زۆر گوێی پێ نادا)): ئێ باش، بۆم دانێن خەمتان نەبێ.

ڕەمزی: نا بەو ناکرێ نیگار خان.

شەنیا: ئەی تۆ نەتوت پێم ئەکرێ؟

ڕەمزی: نا بۆ تۆ ناکرێ دادە گیان.

نیگار: بۆ؟

ڕەمزی: نیگار خان! کەسێک مەبەستی ئیشێک بێ زۆر بە جددی وەریئەگرێت و ئەیەوێت زۆرترین زانیاریی لەسەر ئیشەکەی دەستکەوێت.. ئەم کچە زۆر گرنگیی پێ نەدا، زۆر بە ئاسانیی سەیریکرد.

شەنیا: ئێ دوایی سەیری نەخشەکە ئەکەم و لەسەر ئەوە ئەڕۆم، خۆ تەیارە نییە؟

ڕەمزی: بەڵێ بۆ ئێمە لە تەیارە دروستکردن گرنگترە، گەر ئیشەکە سەقەت بێ، ناوبانگمان بە خراپیی ئەزڕێ.

نیگار: ئاخر ئەویش یەکەمجاریەتی شارەزای سروشتی ئیشی ئێمە نییە، هەڵەیەکی لەسەر مەکە بە ماڵ.

ڕەمزی: هەڵەی یەکەم، گەنبوونی دووابییەکەیەتی، یەک ئیشی ڕاست نایەتە دەست.

شەنیا: ئەوە چییە لە ئێستاوە ڕکەبەرایەتیم ئەکەی کاکە؟

ڕەمزی: کەی تێگەیشتی لە تەیارە دروست کردن گرنگترە، ئەوسا دەستبکە بە ئیش.

شەنیا (( وەک سکاڵا کردن)): نیگار خان!!!!!!

نیگار: دەی سەرفی نەزەرکە ڕەمزی گیان با ئەو ئیشەکە بکا.

ڕەمزی: ئەو بچێ من ناچم بەلای ئەو ئیشەیا.

نیگار: کێشە نابێ! با فێریش بی باشترە شەنیا گیان.. شێوازی ئیشکردنی ئێمە شارەزایی زۆرو بە هەند وەرگرتنی بچوکترین زانیاری لەسەر ئیشەکەو دەوامی تەواو و چالاکیی و وریایی لە جێبەجێکردن وسەرنجی وردو تێکەڵ نەکردنی ئیش بە هیچ شتێکیترو سەلیقەو کوالیتی بەرزو داهێنانە.. هەقی خۆتە تۆش وا زوو فێر نەبی، بەڵام لە دووابیدا سەرکەوتووترین ئەبی و خەڵکیش زۆر ڕووت تێ ئەکا.

شەنیا: یەعنی وەک ڕۆبۆت ئیش بکەین.

نیگار: ڕێک کاتی دەوام ئاوایە، سەیرم مەکە لە ماڵەوە کات بە خۆشیی بەسەر ئەبەین، ئێرە شتێکیترە کچم، پارە بەدەستهێنانە.

شەنیا: باشە زەحمەت نییە ئەو شتانە بڵێیتەوە بینوسم، هەموویم بیرچووەوە.

(( پێکەنینی نیگار، ڕەمزی تەماشاشی ناکا)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٨٢٨ – ڕ/ن – دوکانی مۆبایل:

(( ڕێژوان و سەلوا گرژن))

سەلوا: ئەوە هەمووی لەسەر هەڵەی دە دۆلار؟

ڕێژوان(( تووڕە)): مەسەلە دە دۆلار نییە، مەسەلە تێنەگەیشتنتە لە هەموو شتێک، تۆ بە من تێناگەیەنرێیت و بڕایەوە.

سەلوا: ئای ئای ئای! ڕێژوان؟ ئەوە لەکەیەوە فێر بووی ئاوا قسەم لەگەڵ بکەی؟ تۆ کەی وابوویت؟.. چەند ڕۆژێکە پیس گۆڕاوی ئەزانی؟

ڕێژوان(( ڕووی لە لایەکیتر)): بێ ئەقڵیی تۆ گۆڕیومی، تازە درکم پێ کردووە چەند نەفام بووم کە باوەڕم بە سادەییت ئەکرد.. بەڕاستیی سادەیی نییە، گەمژەییە!

سەلوا (( سەرسام)): ڕێژوان؟ ئەوە چییە ئازیزم؟ وا قسە ئەکەی وەک دەمێک بێ لێم پڕ بیت، قسەم پێ ئەڵێی؟ ئەوە چییە ئەمڕۆ من ئەیبینم؟ (( سەر بۆ ئاسمان بەرز ئەکاتەوە)) خوایە گیان لێت ئەپاڕێمەوە خەوێکی ناخۆش بێ و هیچیتر.

ڕێژوان: لە خوا مەپاڕێوە، هەوڵ بدە خۆت چاککەی، ئەو گەمژەییەت چاک بکەی، ئەوەندە گێل نەبی باشترە، نەک هانا بۆ خوا بەری!

سەلوا (( ئەگری)): ڕێژوان ئەگەر شەڕی منالم پێ ئەفرۆشی؟ بە شتیتر دەریمەبڕە گیانی من! ئەوە خەلاتی خوایە!

ڕێژوان: ئۆوهۆۆۆۆ بەدەست جانانەیی تۆوە، من سوپاسی خوا ئەکەم کە منالی نەداینێ.. من لە گێلێتیەکەت پەستم.. بەڕاستی ناتوانم تاسەر ژین لەگەڵ گێلێکدا بەسەربەرم.

سەلوا: وای ی ی ی!!!! یەعنی بیر لەوەش ئەکەیتەوە جیابیتەوە؟ ئادەی گێلێتیی منت لە چیدا بینیوە ڕێژوان؟ وا چەند ڕۆژێکە لالووتی.. بە ڕاستی ئەمەت لێ قبوڵ ناکەم، هەر لە خۆتەوە لەسەر هیچ پڕ جنێومکەی.

ڕێژوان: ئێ منیش خوا خوامە قبوڵی نەکەیت و مل بشکێنی و بەرچاوم بەردەیت.

سەلوا(( گریانی زۆر)): ئەوە چییە ڕێژوان گیان، چیم کردووە؟ توخوا ئەگەر لە شتێک لێم عاجزی پێم بڵێ، داوای لێبوردنت لێ ئەکەم بۆ هەر شتێک کە بە هەڵە ڕوویدابێ، بەڵێن بێ ٣ ڕۆژ هیچ ناخۆم بۆ ئەوەی جێی ئەو دە دۆلارە بگرێتەوە.. بەخوا تەنها هەڵەیەکم هەر ئەوەیە. هیچ شک نابەم.

ڕێژوان: نا تۆ فێری دەمدرێژیش بووی.. پێم ئەڵێی لێت قبوڵ ناکەم.

سەلوا: ئێ دڵم گەرم بوو ئەو هەموو سوکایەتیەت پێکردم و واموت.. تکایە ببورە، هەرکاتێ مامە زوبێر ئەڵێ زەللەی زمان بوو.

ڕێژوان: ئێ ئەو زەللەیەی باسکرد، کە ڕاستییەو زمان تەتەڵەی تیا ئەکا، ئەگینا نیەتێکت هەر هەبووە بیڵێی.. ئادەی بزانم قبوڵی ناکەی چی ئەکەی؟ کەسیترت بنیاتناوە؟

سەلوا: ئەی هاوار کەسیتری چی ڕێژوان؟ خۆت باشم ئەناسیت.

ڕێژوان: نا هەر ئەوەندەت ئەناسم کە وامئەزانی ئاقڵیت و بۆم دەرکەوت نەک هەر گێل هەر زۆریش گێلی.

سەلوا: باشە، ڕاستە من گێلم.. با ئێستا ئەم بابەتە دابخەین و (( ڕیایی بۆ ڕێژوان ئەکا)) هەروەک خەوێکی ناخۆش بووبێ ناچینەوە سەری.. باشە گیان و دڵەکەم؟

ڕیژوان: با جارێ وابێ.. دڵنیابە بچووکترین بێ ئەقڵیی و گەمژەییت لێ ببینمەوە، لێت نادەم، من باوەڕم بە لێدانی ژن نییە، بەڵام زۆر شتی نێوانمان ئەگۆڕڕێ.

سەلوا(( پێکەنینێک بە هەناسە ئەهـ استهزائي )): لێدانیشی تێکەوت.. باشە چاوەکەم بە دڵی خۆت، دارکاریشم بکەی هەر خۆشم ئەوێی.

ڕێژوان(( تورە)): توخوا ئەگەر واز لەو قسە بێتامانە نەهێنی؟ خۆ هەرزەکار نیین؟

سەلوا(( هەناسە هەڵئەکێشێ و خۆی ئارام ئەکاتەوە)): باشە ڕێژوان گیان، هەرچی تۆ بیڵێی ئەوە ئەکەم، بەسەرچاو.. (( کەمێک بێدەنگیی و مۆبایلێک دەرئەهێنێ)) ڕیژوان ئاگات لەو بەرنامە تازەیەیە هاتووە (( مۆبایلەکەی لێ نزیک ئەخاتەوە)) ئەها !!!!!

(( ڕێژوان بە پشتە دەستی ئەکێشێ بە مۆبایلەکەی دەستی سەلواداو لە دەستی ئەکەوێ و خۆی ئەچێتە دەرەوە.. سەلوا هەڵیئەگرێتەوەو بێتاقەت ئەبێ))

سەلوا(( لەبەر خۆیەوە)): ئەبێ بۆ وا بکا؟ چاوەڕوان نەکراویش نەبوو، چەند ڕۆژێکە قسەی ڕەق و بە تویێکڵ و ئێ هەڵبەت دواتر ئەبێ بە توورە بوون و ئێ وا باسی لێدانیش ئەکاو... خوایە ڕەحمکەی، خوایە ئەوەی بیری لێ ئەکەمەو ڕوونەدا، هیچ پەنایەکم نییە بمگرێتە خۆی خوای گەورە، هەر تۆم هەیت..

(( سەردائەخاو ئەگری))

Cut

دیمەنی – ٨٢٩ – ڕ/ د – ناو سەیارەی نیزام:

(( نیزام چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباخ شۆفێرەو شاموراد بە تەنیشتیەوە))

شاموراد: من پێی ئەڵێم، ئەو بۆ یەکێ ئەگەڕێ ئەو ئیشەمان بۆ بکا، ئێستا پێی بڵێم ئەو کەسە هەیە، ڕەنگە لە خۆشیا جرت و چەقەنەش لێبا.

نیزام: بەڵام هیچ نەبێ ئەبێ ئەمڕۆو سبەی کەمێک بگەیەنیتە دەستم، ئەگینا ئیتر متمانەم پێ ناکا، ئەوەش بۆ من هەر زۆر خراپە.

شاموراد: جا خۆ ئەوە بەدەست من نییە، کە پێموت ئەوەشی پێ ئەڵێم بڕێکم بۆ تۆ بداتێ؟

نیزام: ئەی لای ناسیاوێک دەست ناکەوێ؟ هەر یەک بەش، تا پێی نۆش ئەکەم و بۆ دواتریش ئەوی پاشام پێ بگەیەنە.

شاموراد: پەلە مەکە نەک پاشا ڕازیی نەبێ ئەو ئیشمان بۆ بکا!

نیزام: ئەویش ڕازیی نەبێ، تازە بەڵێنم داوەتێ، خۆم پەیای ئەکەم و بە پارەی خۆی کاسبییەکەش ئەکەین.. تۆ هەر بەشێکم بۆ پەیاکە، بۆ ئەمڕۆ زۆرم پێویستە.

شاموراد: باشە کەسێک هەیە، پێی ئەڵێم ئەگەر ئێستا لای بێ.

نیزام: ئا بەساقەی دڵت بم.

شاموراد: ئەوە چییە ئەوەندە پەرۆشی و خۆت بۆ قیت و قۆز کردووە؟

نیزام: کورە زۆر ڕۆشتووین، هەر لە دەعوەتەکەیا خەریک بوو ڕازیی بکەم شووم پێ بکا.

شاموراد: ئەوە بەڕاستتە، یەعنی ئەبی بە خەزوری هەڵشۆ کەرە؟

نیزام: باوەڕ بکە هەر بیهێنم یەکەم ئیشم لێسەندنەوەی کچەکەی ئەبێ لەو هەڵشۆ خوێڕییە.

شاموراد: خۆ تۆ دزیت بۆ ئەکرد؟! بۆ وا لێی هەڵگەڕایتەوە؟

نیزام: کاکە ئەو هەتیوە چاوی بڕیوەتە سامانەکەیان، جا بۆ هەر بۆ خۆم نەبێ؟ بەس تۆ شاموراد هەندێ پیاوم بۆ پەیاکە.

شاموراد (( بەسەرسوڕمانەوە)): پیاوت بۆچییە؟

نیزام: چومەتە ژێر کلێشەیەوەو بە نیازم خۆی بکەم بە پاشایەکیتر.. ئەوسا خاڵە! هەر بە سەروەتەکەی ئێستایەوە ناوەستم، خۆم ئەزانم ئەیگەیەنمە کوێ؟ مێردی ئەبم و تێی ئەگەیەنم شتەکان بکا بە ناوی منەوە نەک ئاشکرابین.. خۆم لە هەموو شتێ ئەدزمەوە بە بیانووی پاراستنی سامانەکەوە.. هەر کاتێکیش ئاشکرا بوو، ئەوە ئەوە پاشایە نەک من، زۆر بە ئیسراحەت هەرچی هەیەو نییە، بۆ من جێ ئەمێنێ.

شاموراد: بەخوا زۆڵی ساختەچی! خۆت بەگرتی بدەی، ئەیدەی (( پێکەنینی هەردووکیان بە دەنگی بەرز)) دەی کاکی زاوا.. با بێم ببینم، بزانم بوکێ چۆنە ~~هههههههههههه~~.

نیزام: وەڵا ئیتر خەسووی هەڵشۆ بێ ئەبێ چۆن بێ هههههههه

شاموراد: پیرۆز بێ، خۆ ئەزانم تۆ خۆی ناهێنی پارەکەی ئەهێنی.

نیزام: ئەگەر یەکێ ژن بێنێ ژنەکەی فێری تلیاک ئەکا؟ هههه کاکە تلیاک بەس بۆ خەڵکە، بۆ خۆمان نییە بقەیە.. دەی توخوا تۆزێ خێرا ئەو تەلەفونە بکە، من ئەزانم ئەمڕۆ کە هات لە ڕێوە داوای ئەوە ئەکا، کەمم لە دڵیا شیرین نەکردووە؟!!

شاموراد (( تەلەفون دەرئەهێنێ)): لێت ناترسم، لەوانەیە ئەمشەو خەوی پێوە بینیبێ.

(( پێکەنینی هەردووکیان بە دەنگی بەرز، نیزام دەست بە بۆینباغەکەیا ئەهێنێ، وەک تەلەفونەکە وەریگرتبێ))

شاموراد: ئەلووو برا چۆنی؟

Cut

دیمەنی – ٨٣٠ – ڕ / د – عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ مشتەری بەڕێ ئەکا، چەند مێردمناڵێک کۆبوونەتەوەو نۆکاو و لەفەی نۆک و پاقلە داوائەکەن و هەندێکیان لەسەر خواردنین.. هەڵشۆ دێت و لەبەردەمی دوکانی لەنگەکەدا بە چیچکانەوە یان لەسەر شتێک دائەنیشێ و دیقەت خدر٣ ئەدا.. دووان لە خزمەکانی هەر بە جلی ئاساییەوە دێنە بەردەمی))

یەکێکیان (( بە زمانی دەشتەکی)): فەرموو ئامۆزا؟!

هەڵشۆ(( سەرێک هەڵئەبڕێ)): بۆ لای ئەو پیاوە هاتووم چاوەڕوانم لێبێتەوە.

ئەویتریان: کاکە سمکۆ(( خدر٣ ئاوڕ ئەداتەوە)) ئەم کابرایە بۆ لای تۆ هاتووە.

خدر٣(( دێت بەرەو لایان، بۆ یەکێکیان)): بڕۆ بەڕێیانکە(( هەردووکیان ئەچن بەلای عەرەبانەکەوە)).. ها هەڵشۆی ناموبارەک، ئەمجارەیان چیت لێدزراوە؟

هەڵشۆ: نا، هیچم لێنەدزراوە کاک سمکۆ.. پاشا ناردوومی دوو قسەت لەگەڵ بکەم.

خدر٣: بۆ بە ناخێری گیانت تۆش سەر بە پاشای؟ هههە وەڵا بابە پاشایەکی ترسناکە (( پێکەنین)) دەی تێی تورێنە! ئەگەر ئێوە سەری منتان نەخوارد، هیچم نەزانیبێ!

هەڵشۆ: نا کاک سمکۆ، ئەگەر ئێمە نەبووینایە، ئەو ڕۆژە پۆلیس گرتبووتی.

خدر٣: پۆلیس هەقی چییە بەسەر منەوە؟ ئەگەر بیەوێ بمگرێ، خۆ خۆم نەشاردۆتەوە؟ هەر لێرەم و ڕۆژانە بەمناوەیا جرت و فرتیانە.

هەڵشۆ: لەوێ جیاواز بوو.. ئەوان هەواڵیان وەرگرتبوو پاشاو کەسێک لەو ئوتێلە کۆئەبنەوە، تۆش هیچ ئیشێکت بە ئوتێل نییە، کەواتە کەسەکە تۆ ئەبوویت و ئەگیرای.. بەڵام لێرە نازانن ئەو کەسە تۆی.

خدر٣: خۆ لەوانەیە وابێ، بەڵام کاکە پۆلیس و ئاسایش و لەناوبردنی تاوان دایمە بەدوای ئەو ئیشەوەن، بەخوا بەخوا هەر ئەگیرێین.

هەڵشۆ: نا ناگیرێین.. ئاگادار بە بەو مۆبایلەش هەموو شتێک مەڵێ، نەک چاودێریی لەسەر بێ.. لە ڕێگەی منەوە ئیتر پاشا لەگەڵتا ڕێک ئەکەوێ بۆ شوێنەکە.

خدر۳: هەڵشۆ بچۆ بە پاشاکەت بڵێ واز لەم ئیشە بێنێ، بەخوا تاقەتیم نییە.

هەڵشۆ: ناکرێ کاکە سمکۆ ناکرێ برا، ئەزانی پاشا چەندی لە تۆیا خەرج کردووە، تا بن و بنەچەی دۆزیویتەوەو دڵنیا بۆتەوە لەوەی تۆ پاکیت؟

خدر۳: ئەی خۆ پیسیش نییم گەوجە! باشە بۆچی پارەی تیا خەرج کردووم؟

هەڵشۆ: ئێ خۆ تامردن (( ئاماژەی خزمەکانی ئەکا)) خەڵکی گوندەکەتان بەدواتەوە نابن؟ کە ئیشەکەت کرد، ئەوسا ئەتوانی زۆر باش بیانژێنیت، یان ئەگەر ویستیان بچنەوە دێکەیان، ڕەوانەیان بکەرەوەو خۆمان پیاوت بۆ دابین ئەکەین.

خدر۳: ئەک پێ نەگەی هەڵشۆ، خۆتان؟

هەڵشۆ: مەبەستم جەنابی پاشایە.

خدر۳(( توانج)): ئەها!! جەنابی پاشا!!!! باشە ئەوەی وتت هەڕەشەیە یا هاوکاریی، من باش تێناگەم.. من عادەتم وایە لە قسەی توێکڵدار تێناگەم، تا وەکو فیشەک نەنرێت بەناوچەوانمەوە، نەئەزانم لەگەڵ منیانەو نە تێی ئەگەم.

هەڵشۆ: هاوکارییە!

خدر: ئینجا پێم بڵێ سەرسەریی! بۆ بەدزت لە قەڵەمدام و تاوانبارت کردم بەوەی دزیم لێ کردبی؟

هەڵشۆ: من پارەم لێ دزرابوو، کاتێکم زانی پاشا کەسێکی ڕاسپاردبوو، کە دزەکەی دۆزیوەتەوەو ئەو داوایەی پێ تۆمار کردم.. دواتریش دەرکەوت بۆ تاقیکردنەوەی تۆ بوو، بزانێ پۆلیس خاترت ئەگرن یان نا؟

خدر۳: خاتری چی تێناگەم؟

هەڵشۆ: ئەی ئەگەر نەگیرایتایە، ئەوە هیچ متمانەیەکی پێ نەئەکردی، بەڵام کە گیرای، وەڵامی بۆ ناردمەوە کە بە هەڵەیا چووەو داواکەی پێ کشاندمەوە.

خدر٣: ئەهـ ها!! تێگەیشتم.. یەعنی ئێستا تۆ بڵێ، تۆ لای پاشا پیاوکوژی ها ها ها.

هەڵشۆ: نا کاک سمکۆ، من پیاو ناکوژم، ئێستا پلەم بەرز کراوەتەوەو ڕاستەخۆ پاشا ڕامئەسپێرێ ئەمجۆرە ئیشانەی بۆ بکەم.

خدر٣: تۆ پاشات دیوە هەڵشۆ؟ شکڵی چۆنە؟ ترسناکە یان ئاساییە؟

هەڵشۆ: نازانم، لەبەرئەوەی تا ئێستا ڕوخساریم نەدیوە، هەر دەمامکی لەسەردایە.

خدر٣: ئێ ئێستا من چۆن بیبینم؟ لە کوێ؟ با دەست بکەین بە ئیشەکەو ئەو کوڕانەش هەندێکیان حەزیان لە فەلاحەتیەکەیانە، با بڕۆنەوە.

هەڵشۆ هەر زۆر باشە.. شوێنێکیتر دیاریکەو من بە پاشا ئەڵێمەوە.

(( لە میوتیدا یەک دوو دیالۆگ و هەڵشۆ ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ٨٣١ – ڕ/ ن – چێشتخانەیەکی ڕاقیی جیاواز:

(( نارەوەن و نیزام دانیشتوون.. نارەوەن نیگەرانیی نیشان ئەدات و نیزام ڕیایی بۆ ئەکا.. لەناو قسەکاندا شاموراد لە پشتەوە نیشان ئەدرێ و ئەچێتەوە دەرەوە))

نیزام: بەساقەی گوڵە نارەوەن بم، زۆر ببورە، بەچاوی منداڵەکانم پاشا نەیدامێ، چەند هەوڵیشمدا لەگەڵیا بێسوود بوو، ئەیوت با جارێ فێر نەبێ.

نارەوەن(( لالووت)): بۆ؟ خراپە؟

نیزام: ڕێک بە پێچەوانەوە، ئەوەندە خۆشە، ئەڵێ ئەگەر لە ئێستاوە فێری بێ باش نییە، سەگبابە خەمی ئەوەیەتی ئیتر هەر ببی بەنگکێش و ئیشەکە نەکەی.

نارەوەن: ئەوە بە ڕاستتە؟ ئەگەر وا خۆش بێ تۆ باسی ئەکەی، بە کیلۆ بۆ خۆمی ئەکرم.

نیزام: هههە چەند خۆش ئەڵێ بە کیلۆ؟! هەموو ئەوەی هەتە نارەوەن خان هەر بەشی نیوکیلۆیەک ئەگەر بکا یا نەکا، ئینجا کیلۆ ئەزانی چییە؟ بەشی هەموو عومرت ئەکا.. ئێستا ئەگەر بۆت بێنم هەر ١٠ گرامێکت بۆ ئەهێنم.. یەکەمجارو تا چوارەمین جاریش وامان بکردایە هەر بە بۆن بیکێشی، تا فێر ئەبی زۆر باش ئەبوو.. بەس من پارەی ئەوەم نییە.

نارەوەن: تۆ یەکەمجارت نەهێناوە باسی دووەم و چوارەمی چی ئەکەی؟ خێرا با نانەکە بخۆین و بڕۆین، بەڕاستی نامەوێ لەگەڵتا دانیشم و خەڵکیش بمانبینێ بێ سوود.. هەرکاتێ ئامادەت کردو پێت بوو، تەلەفونم بۆ بکەو دائەنیشینەوە.

نیزام: نا نا وا دڵڕەق مەبە!

نارەوەن: بۆ کاکە نیزام چیمان لە نێواندایە تا دڵڕەق بم یا نەبم؟ ئەو شتەیەو نەتهێناوە.. پەیوەندیمان هەڵەپەسێرین تا شتەکە ئەهێنی.

Cut

دیمەنی – ٨٣٢ – ڕ/ د – کارگەیەک:

(( لە دەرەوە ڕامالْ و سەرچلْ بەدەم قسەوە پیاسە ئەکەن))

سەرچلْ: هیچ دەرفەتێکی قسە لەگەڵاکردنی نییە.. لە ئۆفیسێکایە، هیچ کەسێک ئیشی بەوشوێنە نییە تا بچم بۆ پرسیاری شتێکیش.

ڕامالْ(( بیرکردنەوە)): سەرچلْ تۆ لێیگەڕێ، شتێکم لە خەیاڵایە زاهیدی هاوڕێمان بەوجۆرە ئەم ژنەی ئێستای ڕاوکرد.. پیشانگایەکی سەیارە هێنانی بۆ ئەو بابەتە کردەوە.. ئەوسا نەک ئۆفیس، پێی چووە ماڵی کچەکەشەوە.

سەرچلْ: چۆن؟ سەیرە!

ڕامالْ: کارتێکی پیشانگاکەی برد بۆ ماڵەکانی دراوسێی و دواتر ماڵی ئەوانیش، وتی ئەم پێشانگایەمان کردووەتەوەو بە تایبەت سەیارە لە یابانەوە ئەهێنین و لە نرخی بازاڕیش کەمتر.. کچە دەرگای کردبووەوە، باسی قیستی کردبوو.. زاهید یەکسەر تێی گەیاندبووە ئەو ئۆفەرەی بە تایبەت و بە تەنها بۆ ئەکاتەوە.. بەرەبەرە لەیەک نزیک بوونەوەو داوایکردو هەموو شتێ بڕایەوە.

سەرچلْ: ئەی من چی بکەم؟

ڕامالْ: هەرچۆنێکە ئەبێ من وا بکەم، تۆو ئەو کچە پەیوەندیتان هەبێ.

سەرچلْ: کاکە من حەزم لێ نییە، تۆ بۆ ئەوەندە سووری پەیوەندیم هەبێ لەگەڵیا؟

ڕامالْ: بۆ ئەوەی بە وردیی تێی بگەیەنی و ئەویش بە ئامۆی برای بڵێ لە شەنیا دووره بکەوێتەوە، زۆر شت باس بکاو دڵی براکەی لێ ڕەشکا.. چونکە من نامەوێ ئەو کچە لە خۆم زیاتر لەگەڵ هیچ کەسێکا ڕێککەوێ بۆ هاوسەرگیریی.

سەرچلْ: دەی کە تۆی خۆش نەوێ، سوودی چییە؟

ڕامالْ: ئەوە ئیشی منە چۆن خۆشەویستیی بەسەرا بسەپێنم، دوای هاوسەرگیریی خۆی دروست ئەبێ.

سەرچڵ: تا ئێستا تۆ پارەیەکی زۆرت تیا خەرج کردووەو ئەوەندەی منیش بزانم ئەوە ناهێنێ وای بۆ ئەکەی، تۆ خەریکە ژیانت بە خەسار ئەدەی بۆ هیچ!!!

ڕاماڵ: هیچ نییە سەرچڵ گیان.. بەڵێ ئەو هەموو ژیانمە، گەر ئەوم نەبێ ئەوسا ژیانم هیچە، جارێ ئومێدێکم ماوە.

سەرچڵ: ئەوەیان بەس خۆت قەناعەتت پێی هەیە.. من پێموایە ئاسنی سارد کوتانە، تۆش کەیفی خۆتە.. هەرچی بە من بکرێ، من لەبەر تۆ ئەیکەم، ئەگەر سەریشم دانابێ.

ڕاماڵ: سەرت خۆش بێ، جا من چۆن ئەهێڵم بگاتە ئەوەی یەک مسقاڵ مەترسیی و زیان بگا بەتۆ؟ تۆ برای منیت.. ئەهـ، ئەزانی چی بکە؟

Cut

دیمەنی – ٨٣٣ – ڕ / ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو شەنیا ))

نیگار: ئاخر کاک ڕەمزی تەنها لە ئیشا زۆر ڕەقە، چەند بڵێی پیاوێکی باشە، زۆرجار قسەمان لەسەر ئەوە کردووە، ئەڵێ ئیشی ئێمە ئەندازیارییە، هەڵەی یەک سانتیمەتر، ئیشێکمان لێ ئەشێوێنێ و ئەبێ بە زەرەر.. ئەڵێ من لە ئیشا خاتری باوکیشم ناگرم، هەرکەسێ دێتە ئێرە، ئەبێ زۆر جدیی و وردەکار بێ، ئەگەر وا نەبێ، با بچێ لە شوێنێکیتر ئیش بکا.

شەنیا: ئۆکەی ئۆکەی تێ ئەگەم، بەڵام من یەکەم ڕۆژمە.

نیگار: ئەو زۆر ئاسانی کردو منیش تۆم هەڵبژارد تا زووتر فێری ئیشەکە بیت، تۆش بەینی خۆمان بێ زۆر ساردو سڕ بوویت و زۆریش گوێت پێ نەدا.

شەنیا: هههه دەی چی بکەم شارەزای تەبیعەتی نەبووم هههه.

(( زوبێرو ئامۆ دێنە ژوورەوە.. حەپەسانی شەنیاو ئامۆ.. دوای سڵاو، ئامۆ شەنیا فەرامۆش ئەکا ))

زوبێر: ئەڵێی باش خۆتان ئامادە کردووە نیگار خان؟

نیگار: بە چیا ئەوەت زانی؟

زوبێر(( دەست بەسەر نەخشەکەدا ئەهێنێ )): ئەمەم بینی (( بۆ ئامۆ )) ئەها کاکە ئامۆ چەند مەزبوتن، پێموتی هەموو شتێ لێرە بە نەخشەو پێوانەکارییە، بۆ من وا وەسفی ئەم ژنە بەڕێزە کراوە.

ئامۆ: بەڵێ ڕاستە، بەو هیوایەی ئیشەکەش زۆر جوان بێ.

زوبێر: من بەرەو ڕووی کێ ئەبمەوە ڕۆژانە؟ مەبەستم سەرپەرشتیاری کاروبارەکانتانە.

شەنیا: من و نیگار خان سەرپەرشتی ئەکەین.. من ناوم شەنیایە!

زوبێر(( دەست بۆ تەوقە درێژ ئەکا )): زۆر خۆشحاڵم کچی جوان.. منیش ناوم زوبێرەو ئەم کوڕە جوانەش کاکە ئامۆ.. وامزانی هەر لای ئێمە نەوەکان کۆ ئەبنەوەو پرۆژەیان هەیە؟!

شەنیا: خۆشحاڵم!

نیگار: نا کاک زوبێر ئێمە ڕۆژانە ئەبێ خۆمان ئەبدەیت بکەینەوە، ئەگینا فریای ئەم نەوەیە ناکەوین، زۆر ئەزانن.

زوبێر: ببورە وتت خۆمان چی بکەینەوە؟

نیگار: ئەبدەیت، مەبەستم خۆ تازە کردنەوەیە.

زوبێر: ئەهـ ها! هههه.

ئامۆ: لەلایەن ئێمەوە، تەنها ڕووبەڕووی مامە زوبێر ببنەوە، ئەو زۆر باش سەر لە ئیش و کارەکان دەرئەکا.

شەنیا: زۆر باشە، ئەم نەوەیە باشتریش لە زمانی یەک ئەگەن.. کەواتە منیش لە ئۆفیس کارەکانتان بۆ ڕێک ئەخەم، با نیگارخان ئەرکی سەر پرۆژەکە وەرگرێ.. ئەگەر هەر پێویستییەک هەبوو، من لە ئۆفیسم، ئەمە شوێنمە.

زوبێر: هەر زۆر باشە، کچەکەش ژیرە نیگار خان.

نیگار: هەر کەس لە دەوری من کۆبێتەوە ژیر ئەبێ بەدەست خۆی نییە ها ها ها.

(( پێکەنین و دانیشتنی زوبێرو ئامۆو نیگار.. شەنیا ئیزن ئەخوازێ و داوای یارمەتی ئەکاو ئەوان فەرمووی ئەکەن و ئەچێتە دەرەوە ))

نیگار: ببورن زۆر سەرقاڵی ئیشەکەیە، هەر خەریکی پێوانەکارییە.

زوبێر: ئاساییە خانم.. ئێمە بۆ بینینی وێنەو نەخشەی کارەکانیترت هاتووین، ئەوەی باستکرد.

Cut

دیمەنی – ٨٣٤ – ڕ / د - چایخانەی گەڕەک:

(( شەماڵ و ئاکار))

ئاکار: کاکە تۆشم لێ مەبە بە حەمە تایەر لە ختوخۆڕایی ١٥ساڵیان دا بە تەنگەیا.

شەماڵ: من نەیکوژم ئۆخەی ناکەم.

ئاکار: نا نا تۆ زۆر خراپ بیری حەمەتایەر ئەکەی، ئەتەوێ ١٥ ساڵەکەی لەگەڵا بەڕێکەی.. بەڵام هەی نەگبەتی شووم، ئەو نەشیکوشت ١٥ ساڵ حوکمدرا، تۆ بیکوژی، بیلڵاهی ڕێک بۆ قەنارەکە.

شەماڵ: ئەی مەعقولە لای خەڵک سوکایەتیم پێ بکاو بڵێ بە شەماڵم ڕابواردووە؟

ئاکار(( هەڵئەسێتە سەرپێ و بۆ دانیشتووان)): کاکە گوێبگرن، ئەو برزووە ساختەچییە دوێنێ شەو زۆری پێ ڕابواردم، تا وەک منال نەیخستمە گریان، دەستی لێ هەڵنەگرتم.

(( خەڵکەکە چەپڵە لێدان بۆ برزو، هەندێکیان ئەڵێن هەی ئافەرین برزو، دیارە تۆ موستەحەق بووی))

ئاکار: بە دڵت بوو؟ ئەها چۆن پێم پێ ئەکەنین، خۆ بینیت؟

شەماڵ: جا تۆ تەحەمولت هەیە گاڵتەت پێ بکەن، من نیمە، بەدەست خۆم نییە.

ئاکار: کوڕی باوکم بە من و تۆشەوە خەڵک گاڵتە بە هەموو کەسێک ئەکا خۆی نەبێ.. تۆ ئەسڵەن نابێ گوێی بەیتێ.. دانیشەو دووبارە توشی پۆلیس و دادگامان مەکەرەوە.

شەماڵ: ئەوە ڕاستە، تا تێنەکەوی بەهەندی وەرناگری.

ئاکار: من لەمەولا هەر کێشەیەکم هەبێ ئەیبەمە (( ئاماژەی شوێنێک)) ئەهاااااااا ئەیبینی؟.. ئەیبەمە ئەو بنکەی پۆلیسە، هێزی مەچەک و خزم و دۆست و ئەحباب هەمووی فشەیە، کە تێوەگلای تیا ئەچی.. جا ئەوانیش سیچڕمەن، لە کۆڵ کەس نابنەوە، با بزانی!

Cut

دیمەنی – ٨٣٥ – ڕ/ د – سەر عەرەبانەی خدر٣:

(( کەسێک دێت داوای نۆکاوێک ئەکاو بە سەمموونەوە ئەیخوا.. کە کەس لەسەر عەرەبانەکە نامێنێ.. پێنج هەزارییەک ئەدا بە خدر٣و بە سووکیی پێی ئەڵێ))

کەس: ئەو پارەیە مەکەرەوە نامەیەکی زۆر گرنگی تیایە بۆ تۆ.

خدر٣(( پارەکە ئەخاتە گیرفانی سەرەوەی)): نامەی کێیە؟

کەس: پاشا.. باقیم بدەرەوە با من بڕۆم.

(( خدر باقیی ئەداتەوەو کابرا ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ٨٣٦ – ڕ/ د – باخەکەی ماڵی گێلاس:

**<u>نینا مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:**

ئاواش ژیان بەڕێوە ناچێ.. نا.... نە دەرەوەیەک و نە ئیش و نە هیچ هەر هیچ.. خەریکە مێشکم بتەقێ.. چارەسەری نەکەم توشی خەفەقانیش ئەبم و بۆ نا؟.. ئەک خوایە بە ڕەحمەتی خۆت جەڵتەیەکم بۆ بنێری و منیش ببەیتە لای ئەوان.. ئەمە ژیان نییە نیی.... چی بکەم خوا هاوار!!! کەس وا ناژی! شوو ئەکەم؟؟؟؟ لەم کاتەیا، تا قاپیی قیامەت لێم نابڕنەوەو ئەڵێن بە دەمی پڕ خوێنەوە خۆی بۆ نەگیراو شووی کرد، نایکەی؟؟؟؟؟ هەر وەی! کێ ئاگای لە حاڵی کێیە؟ .... بچمە سەرئیش؟ نا نەبەخوا باوکم حەزی لێ نەبوو... هەموو دەرگاکانم لێ داخراوە... بۆ پیاوێک ئەبینم، تا بتوانم بڕیارێک بدەم بۆ مانگێکیتر؟، نا تۆ بڵێ دوویتر؟ هەر ئاوام هەبوو چاوەڕێی وەڵامم بوو، ئەویش باوکم پێی ناخۆش بوو.. نا چۆن لە قسەی باوکم دەرئەچم؟.. نا... (( بێدەنگییەک)) ئەی چی بکەم؟ هیچ چارەسەرێکیشم نییە لەو زیاتر.. ئەویش با چلەی ڕۆڤە گیانیش تەواو بێ، ئەوسا مەگەر بیرێکی لێ بکەمەوە.....

هەرخۆی وەک محاسبة کردن: لە قسەی باوکت دەرئەچی؟ ئەوەندە باوکت خۆش ویست؟

هەر خۆی: دەی چی بکەم؟ من پێویستیم بە کەسێکە لەم هەموو ئازارە ڕزگارمکا.. کەس نییا!!!!! (( ئەگری)) هیچ کەس.

(( دەست بەسەریەوە ئەگرێت و ڕوو ئەکاتە ئاسمان، هەر ئەڵێ، کەس کەس کەس))

Cut

دیمەنی – ٨٣٧ – ڕ/ن – ناو دوکانی خدر٣:

(( خدر دەرابەی داداوەتەوە، یان گەر دەرگای شوشە بوو ئەچێتە شوێنێکەوە، کەس لە جادەکەوە نەیبینێ.. نامەکە داناوە لە ڕوناکیداو وێنەی ئەگرێت.. لەسەر شاشەی مۆبایلەکە دیارە ئەنوسێ: سڵاو.. دوا گۆڕانکاریی.. دواتر نامەکە ئەخوێنێتەوە))

دەنگی خدر: لە ژێر چاودێرییەکی توندی پۆلیسدای، ئەم ماوەیە خزمانت وێڵکەو لە خۆتیان دوور بخەرەوە.. تا ئەو ڕۆژەی زانیاریی هەڵگرتنی ئەو چاودێرییە، ئێمە پەیوەندیت پێوە ناکەینەوە، تەنها نۆک و پاقلەی خۆت بفرۆشەو هیچ چاومان بۆ مەگێڕە، سەردانت ئەکەینەوە.

(( خدر سەربائەداو خەندە))

Cut

دیمەنی – ٨٣٨ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز مۆبایلەکەی بەدەستەوەیەو ڕایئەوەشێنێ))

بەهێز: ئەم نامەیە گرنگە، زۆریش گرنگە مولازم ئاری.. پیلانی تازەیە بۆ دوورخستنەوەی ئەو هێزەی بە دەوروبەری خدرەوەیەو دواتریش فراندنی.. ئیتر هەرچییەکیان زانیوە، خۆیان ئەزانن.

ئاری: گەورەم پیلانەکە زۆر ڕوونە، هیچ هەیە بۆ چارەسەر کردنی؟

بەهێز: ئێمە جارێ لەگەڵ وەزعەکەیا ئەڕۆین، بزانین بە کوێ ئەگا.. هێزەکە بڵاوە پێ ئەکەین، هەر لەو دەوروبەرەدا.

ئاری: گەورەم خۆ دوور نابن لە خۆیەوە؟

بەهێز: نا زۆر دوور نابن هەرچەندە کێشەش نییە.. چەند قەنناسێک لەسەر ماڵە باوەڕپێکراوەکانی ئەو دەورو بەرە دائەنێین ئەگەر هەبوو؟ یان بچۆ بزانە چەند فەرمانگەی دەوڵەت لەو دەوروبەرەیە.. ئاماژەی تەقە کردنیش ئەدەینەوە بە حمەخدر.. جگە لەوەش لە خاڵی پێک گەیشتنەوەی شەقامەکانیش چەند سەیارەیەکی پۆلیسی فریاکەوتن دائەنێین بۆ ڕێگیریی.

ئاری: کەواتە من پەلە بکەم لە دۆزینەوەی ماڵە باوەڕ پێکراوەکان و تەلاری فەرمانگەکان.

بەهێز: بەڵێ تۆ بچۆ خێرا ئەوە بکەو منیش مەفرەزەکان ئاگادار ئەکەمەوە بە پەلە بچن شوێنی خۆیان بگرن و لەگەڵ هێزەکەش قسە ئەکەم بەرنامەکەیان پێ بڵێم.

(( ئاری تحیەو ئەڕوات و بەهێزیش بە تەلەفون))

Cut

دیمەنی – ٨٣٩ – ڕ / د – پارکێک:

(( دڵنیاو ڕێژوان لەسەر کورسییەک دانیشتوون))

ڕێژوان: کچێ تۆ ئاگات لە چییە؟ باوەڕ بکە بیانووی وای پێ ئەگرم، هیچ کەسێک نییە لەسەر ئەم ئەرزە قبوڵی بکا، سوکایەتیی دنیای پێ ئەکەم، ئەو ڕۆژە زللەیەکیشم لێدا، هیچ سوودی نییە، تێمەوە ئالاوە بە ئامان و دامان لێم نابێتەوە.. نازانم چی لێ بکەم؟ کێشەکەم ئەوەیە وەلامێکی وام ناداتەوە، بیکەم بە قسەو بڵێم لەسەر ئەوە تەلاقمدا.

دڵنیا: ئەوەندە ئەزانم کەسێک نییە کبریائی نەبێ! تۆ بەردەوامبە، ڕۆژێ لە ڕۆژان زۆر خراپ ئەتەقێتەوە بەسەرتا، بە جۆرێک بە خەیاڵیش بیرت لێ نەکردبێتەوە.

ڕێژوان: دەی یاخوا! ئەوکاتە ناهێڵم مانگ بخایەنێت دێمە داوات.

دڵنیا(( گرژ)): مانگ بۆ؟

ڕێژوان: ئاخر با نەڵێن لەبەر تۆ تەلاقمداوە.

دڵنیا: کەس وا ناڵێ.. مانگیش زۆرە. هەر لە دادگا تەواو بوون، دێیتە پێشەوە.. خوا ئەزانی ئەویش چەند ئەخایەنێت.

ڕێژوان: نا نا ناهێڵم زۆر بخایەنێت، هەرچییەکی ویست ئەیدەمێ و زوو خۆم ڕزگار ئەکەم.

دڵنیا: ڕێژوان گیان، تۆ وات کرد خۆشم بوێی، ئێستا ئەڵێی بەسەر ئاگرەوەم بۆ ئەوەی تا زووترە بۆ هەتاهەتایی پێک بگەین.

ڕێژوان: ئەی من ئەم هەموو بەزمە بۆ ئەگێڕم.. بیرتە سەرەتا هەرچەند بەساقەو بە قوربانت ئەبووم، تۆ هەر سارد بووی؟ دەی ئەبێ من چەندم پەلەبێ؟

دڵنیا: بیرم یەت یەکەمجار کە وتت بەساقەوبم لە ماڵی دەورانی هاوڕێم بووم، زۆر تێکچووم، ئەوەندەم پێ ناخۆش بوو مەپرسە.. دەوران هەستی پێکردو پرسی چی

ڕوویداوە؟ وتم لەم ڕۆژەیا ناوێری ببی بە ئەدی کوڕێک و تۆزێ ڕووی بەیتێ، یەکسەر بەساقەو بە قوربانت ئەبێ، دواتریش داوای پەیوەندیت لێ ئەکا.

ڕێژوان (( خەندە )): ئاخر نەتئەزانی من بە دڵ بۆت ئەسوتام، ناهەقت نییە متمانەت نەکردبێ.. بەڵام وا بزانم بەم دوو مانگە باش تێمگەیشتووی.

دڵنیا: ئاخر من بە ژیانم خۆشەویستیم نەکردووەو نەمئەزانی دەردێکی ئەوەندە گرانە.. بمزانیایە، هەرگیز ڕازیی نەئەبووم.

ڕێژوان: لە من پەشیمانی؟

دڵنیا: نا لە چاوەڕوانیی!

(( هەستان و پیاسەکردن))

Cut

دیمەنی – ٨٤٠ – عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ قەلەقە بە بەر دوکاندا دێت و ئەچێ.. هەڵشۆ بە ڕاکردن دێت بۆ لای))

هەڵشۆ: ببورە کاکە سمکۆ ئیتر تا بردمیان بۆ لای پاشاو ڕاسپاردەکەی پێوتم، خایاندی، ئەوانیش لە سەرەوە دایانگرتم، هەر مردم تا گەیشتم.

خدر٣: خێرا قسە بکە، چاودێریی پۆلیسم هەر لەسەر ماوە؟

هەڵشۆ: نا قوربان وتی تەواو بووە، ئێستا هیچ کێشەیەک نەماوە.. بەڕاستی لەم دوو مانگەی پێشوودا، هەردوو لامان وەزعێکی زۆر خراپمان هەبوو.. باوەڕ ئەکەی مانگی پێشوو پاشا هیچ کەسێکی نەبینی بێت؟

خدر٣: گرنگ ئەوەیە تێپەڕی و منیش بەم عارەبانەیەوە زۆر هیلاکم.. ئیتر ئەمەوێ پشوو بدەم.

هەڵشۆ: بە پاشا بڵێم پارەیەکت بۆ بنێرێ و دانیشی؟

خدر٣: نا من پارەی ئیشی خۆم نەبێ یەک قڕان لە هیچ کەسێک وەرناگرم، خۆ خێرم پێ ناشێ؟!

هەڵشۆ: کورە با ئەو ئیشە بکەی، ئەوسا نازانی پارە بخەیتە کوێوە ئەوەندە زۆر ئەبێ، هەموو شتێک ئەکڕی و پارەش هەر لە جێی خۆیەتی.

خدر٣: جا وا سێ چوار مانگە بە حساب خەریکین و هیچمان بە هیچ نەکردووە.

هەڵشۆ: ئەیبینی، ئەوپەڕەکەی ئەم هەفتەیەیە، چونکە پاشاش وای وت، وتی زۆر دواکەوتین.. دیارە بە نیازی کۆتایی پێهێنانیەتی، قەت لە خۆیەوە قسە ناکا.

خدر٣: ئیتر با بزانین.

(( لە میوتیدا دایالۆگ و ڕۆشتنی هەڵشۆو گەڕانەوەی خدر٣ بۆ سەر عەرەبانەکەی))

Cut

دیمەنی – ٨٤١ – ڕ/ د – گۆڕستان:

(( نینا لەسەر گۆڕێک دانیشتووە ))

نینا: باوە گیان ببورە، وا نزیکەی ٣ مانگە تۆ چوویتە جێی هەق و منیش تەنیاو تەنیا دێم و ئەچم.. ئەگریم و پێکەنینم لە خۆم حەرامکردووە.. کەس نابینم و کەس نامبینێ،

**نینا مۆنۆلۆژی ناوەوە:**

باوە ژیان ئێستا بۆ من چواردیوارەکەی ماڵی پورم و تەباخ و چێشت لێنان و دڵڕاگرتنی ئەوانە، نازانم بۆ پێمخۆشە ئەمرێکم بەسەرا بکەن و بە خێرایی بیکەم؟.. ببورە باوە گیان قەت نەمویستووە لە ئەمری تۆ دەربچم، بەڵام تەواو تەنیایی بڕستی لەبەر بڕیوم، ئەمەوێ لە ئاوا نزیک ببمەوە، بەو هیوایەی ژیانی هاوسەرگیریی کەمێک سوکنایيمبا.. ببورە باوە، ئەوە ناچارییە، نەک بێگوێیی کردن، ئێستا ئەچم بە ڕۆڤە گیانیش ئەڵێم.. تۆ دڵت باش بێ لەگەڵماو تێمبگە تکایە.. بەڵێن بێ تا مردن نە خۆت و نەڕاسپاردەکانتم بیر نەچێ.. خۆشم ئەوێی باوە گیان.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( هەڵئەسێ و ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ٨٤٢ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( ئەردەڵان بە گورجیی دێتەوە، نەک بە ڕاکردن.. هاوڕێ وەستاوەو چایخانە کەسی لێ نییە))

هاوڕێ(( بە بێزارییی)): ها!!! بۆت برد؟

ئەردەڵان: ئەرەوەڵا تا ژوورەکەی خۆی.

هاوڕێ: باشە بۆ لە ناو هەموومانا پارەی باش ئەدا بە تۆ؟ هەست ناکەی شتی تیایە گەوجە؟!

ئەردەڵان: لە ساڵان و لە مانگان من برسیی و بێ سیپاڵم.. هەتیو بەغیلیی بەوەش ئەبەن ئەو کاکە ڕەوەزە هاتووەو چاویکی لێمە.. تو شەرەف و کەرامەتتان چاوم لە دوای پارەی کەستان بووە.. بەم دەست و بەو دەست ئەخۆن و وەرئەگرن، فزەم لێوە هاتووە؟ کورە عەیبە عەیب!

هاوڕێ(( پێکەنینی استهزائي)): وەڵا ماوتە باسیکەی ئەردەگێڕ.. هەتیو سەری زمان و بنی زمانی تۆ، کاک حەمەخدری داماوە، وا ئەڕوات و وا دێت و وا ئەم ژن و ئەو ژنی بۆ موسەخەر بووەو کورە جا چوزانم، بۆ گوناحت پێوە هێشتووە؟

ئەردەڵان: من باسی تۆو ئەحەو کارە ئەکەم، ئەو برای خۆمەو هەرچییەک بڵێم لەبەر دڵی گران نییە.

هاوڕێ: ئەی کوا، خۆ نەهاتەوە، ئەم هەموو بوختانەشت بۆ هەڵبەست.

ئەردەڵان (( بە مینجە مینج)): سوعبەتم ئەکرد.

هاوڕێ: مینجە مینج مەکە، بزانم ڕەوەز چەندی دایتێ؟

ئەردەڵان: وەڵا شەقیش بەری پێت ناڵێم دەبڕۆ دەی!

Cut

دیمەنی – ٨٤٣ – ڕ/ن - ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری دانیشتوون))

ئاری: گەورەم فرت و فێڵی لەوەیا نییە.. بە هەزار شێوە خدری تاقیکردۆتەوە.. ئەوە دوو مانگە جارێ بە چاودێری پۆلیسەوە دەسخەڕۆی کردووە.

بەهێز: ئەوە تاقیکردنەوەی سەبرو ئارامیی خدرە، تا بزانێ چەند بەدەم زانیارییەکەی ئەوەوە ئەچێ، زۆر باش ڕۆشت، هیچ خاڵی لاوازی نەبوو.. مولازم ئاری پێم باشە ئەمجارەیان ئەو کابرایەی ناوی خۆی ناوە پاشا، هەر شوێننێکی دیاریکرد، خدر بڕوا.. بۆ زانینی شوێنەکەش، درۆنز بەکار ئەهێنین.

ئاری: گەورەم شوێننەکەی بزانرێ، جگە لەو هێزەی لەگەڵیایە، هێز ناردن ئاسان ئەبێ.. بەڵام ڕەنگە هەڵشۆی بۆ ئەوە بەکارهێنابێ، تەشویش بخاتە سەر بیرکردنەوەی خدر.

بەهێز: بە دەرخستنی هەڵشۆ، چەند یارییەکی دەست پێکرد.. هەم دڵنیا بۆوە لەوەی خدر سەر بە هیچ دەزگایەک نییە، چونکە زۆر سروشتیی مامەڵەی لەگەڵ کرد.. هەم ویستی ژمارەی خزمەکانی بزانێت، کە نەمانهێشت بیزانێ.. جگە لەوەش ڕاستە تەشویشی بۆ سەر ئێمەش دروستکرد.. ئەو کابرایە زیرەکە، ڕێ و شوێنی بەجێ دائەنێ، هەر سەرەتا لەوە گەیشتم جێی خۆی بە هەڵشۆ نەوتووەو وەک قوربانیی یارییەکە تەماشای ئەکا.. بۆیە هەڵبکەوتایە خدری پێ ئەفڕاند، نەمانهێشت ئەوەش بکا.. بەڵام بەرامبەر بەوە بەردەوام خدر هەڵوێستێکی وای نیشانداوە، کە هەڵشۆ ڕاپۆرتی باش بداتە پاشاکەی.

ئاری: گەورەم هەر لەگەڵ ئەمجارە شوێن و کاتی بینینی دانرا، هێزەکە بەرەو دەوروبەری ئەو ناوچەیە ئەجوڵێنین کە خدر بۆی ئەچێ.

بەهێز: بەڵام زۆر دوور بێ لە خدرەوە.

Cut

دیمەنی – ٨٤٤ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێرو سەلوا دانیشتوون.. سەلوا ئەگری))

سەلوا: نا بە هەندرێنی برام نەوتووە.

زوبێر: ئافەرین کچم.. دە تۆ مەگری، خۆ تۆ کچێکی ئاقڵی، ئەزانی گریان هیچ سودێکی نییە لە ئاستی بابەتێکی وادا.. ڕاستە ئەتوانی خۆت بە چەکی بزانی دژی پیاوەکەت بەکاری بهێنی، هەرچەند من وای نابینم و هەست ئەکەم هۆکاریتری لە پشتەوە بێت، گەر وابێ ئەوکاتە گریان نەک چەک نییە، بێدەسەڵاتییە.. واتە لە چارەسەرکەرەوە ئەبێ بە نوشوستی هێنەر.

سەلوا: من درۆت لەگەڵ ناکەم مامە، یەک شتێک نییە بڵێم بە هۆی ئەوەوە وا ئەکا، ئەگەر هاتبێ بە خەیاڵما کچێک چووبێتە بن کلێشەی، باوەڕ ئەکەی لە چەند چرکەیەک زیاتر ناخایەنێ، ئاخر ڕێژوان لەو جۆرە کەسانە نییە مامەگیان.. کچێک دێتە دوکانەکەوە ئەو سەردائەخا تا ئەچێتە دەرەوە، یەک نیگای بە جۆرێکم لێ نەبینیوە.

زوبێر: کچم تۆڕی دەروونیی مرۆڤ، بەو ئاسانییە نییە ئەیبینین.. تۆ سەیری زانا دەروونناسەکانیش بکە، ئەمە فرۆیدە یۆنگە ماسلۆ لاکان و ئەوانیتریش، گەر ئەوان هەموو کۆک نەبن لەسەر دیاردەو ڕیتم و سیستمە دەروونیی و پۆلینکردنە بنەڕەتییەکان و تەنانەت لەسەر ڕیزبەندیی پێداویستییە بنەڕەتییە غەریزییەکانیش یەک نەگرنەوە؟ من و تۆ چۆن ئەتوانین بە ئاسانیی سیستمی دەروونیی کەسێک بناسینەوە، ئا مەبەستم سیستمە دەروونییەکەیەتی.. ڕەنگە هەندێک کۆدی هەڵخەڵەتێنەر بکەینەوە، یان نیشانەی هەڵسوکەوتێکی دەروونیی بدۆزینەوە، بەڵام ئەوە لە دەروونشیکاریدا هەوڵێکی سەرەتاییە.. ئەویش پەیوەندیی بە تێگەیشتنمانەوە هەیە.

سەلوا: مامە گیان ئەو قسانەی کردت مانای وایە دڵی باش ئەبێ؟ یان نا؟

زوبێر(( تەماشا کردن بە سەرسوڕمانەوە، بە ناحاڵیی ئەزانێ، خەندەی کورت)): بەڵێ کچەکەم ڕێک مەبەستم ئەوە بوو.

سەلوا(( دڵخۆشیی و عەیارانە)): دەی مامە گیان بۆم ڕوونکەرەوە یەعنی چۆن؟

زوبێر: جارێ لێبگەڕێ بۆ خۆم، تا قسەی لەگەڵ ئەکەم.. دواتر ئەو قسانەت بۆ ڕوون ئەکەمەوە. ئێستا بڕۆ چێشتەکە بێنە، زۆرم برسییە.

سەلوا: وەی بەسەرچاو، هەر ئێستا.

(( سەلوا ئەچێ بۆ مطبخ و زوبێر سەر بائەداو خەندە ئەیگرێ))

Cut

دیمەنی – ٨٤٥ – ش/د- باخی ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆ بە پێوە، نینا جلەکانی کردووە بە پیرۆزیی تۆخ، یان نیللی دانیشتووە.. گێلاس لە ژوورەوە دێتە دەرەوە))

گێلاس: جلەکانم لە ساردییەکە بۆ داناوی.

ئاکۆ: دەستخۆش. (( ئەچی بەرەو ژوورەوە))

گێلاس: بۆم تەواو نەکردی.. ئینجا کوڕەکە کارتی خۆی دانا، ژمارەی تەلەفون و ناونیشانی ئۆفیسەکەی خۆشیانی تیابوو، لای تیرۆژە کارتەکە.. جا ئەگەر تۆ بێیتەوە سەر ئیشەکەی خۆت، من هەستێکم کرد تیرۆژ لای ئەوانی پێخۆشتر بێ، کوڕەکەش حەزی ئەکرد تیرۆژ بچێتە لای، مانگانەکەشی ٧٠٠ دۆلار بوو.. بۆیە حەز ئەکەم تۆ بێیتەوە، کەیفی خۆشتە، یان تۆ بچۆ بۆ لای ئەو کوڕە ئیش بکەی، خراپ دیار نەبوو.

نینا: نەبەخوا پورێ، ڕاسپاردەی باوکم ناشکێنم تا بمێنم.

گێلاس: باوکی نارەوەنیش پێی خۆش نەبووە کچەکەی بدات بە دارەوان و هەر وەکو تۆش پێی خۆش نەبووە ئیش بکا.. کەچی دوایی شوویشی کرد بە دارەوان و هەر خۆشی نەیزانی چۆن دەستیکرد بە ئیشکردن.

نینا: نا پورێ گیان تکایە سترێست ڕاگرە.. بۆ من جارێ زۆر زووە.

گێلاس: ئەی کە بۆ ئیشکردن زووەو ڕاسپاردەی باوکت ناشکێنی!!!! بۆچی تەلەفونت بۆ ئاوا کرد؟ ئەویش هەر ڕاسپاردەی باوکت نییە شووی پێ نەکەیت و لێی نزیک نەکەویتەوە؟

نینا: ئەوەیان شتێکیترەو ناچارییە پورێ گیان، خۆت ئەزانی ئەو کوڕە چیم بۆ ئەکا، جگە لەوەی کەسێکیتر قەت وەکو ئاوام بۆ ناکا!! کەسیتریش شک نابەم تا بزانم چۆن ئەبێ لەگەڵما؟

گێلاس: نینا گیان، تۆ لە هەموو حاڵەتێکدا هەر ئەبێ ڕاسپاردەیەکی باوکت بشکێنی، جا یان ئاوا، یان ئیشەکە، ئێستا تۆ ئاوات هەڵبژاردووە.. منیش پێم باشە ئیشەکە هەڵبژێریت و بچیتە دەرەوەو دنیا ببینی، ئەوسا هەر پیاو زۆرە.

نینا: ئاخر پورێ گیان کێشەی من ئەوەیە، وا بە ئاسانیی پیاو ناچێتە دڵمەوە، هەر یەکەیان و زۆر بە خێرایی عەیبێکیم لێ دەرئەکەوێ، من زۆر هەستیارم لەو بابەتەدا.. دوای ئەوەش هەر کوڕێکم ناسیوە زۆر بە خێرایی بیرم چۆتەوە، کەچی سەرباری ئەوەی لە تەعزێکەی ڕۆڤە گیانیشدا زۆر ساردوسڕ بوو و هیچ سەرەخۆشیشی لێ نەکردم، کەچی بیرم ناچێتەوە.. من پێموایە کەمێکیش لەسەر هەق بوو.

گێلاس: کەواتە تۆ خۆشت ئەوێ و ئیتر مەسەلە ناچاریی و شتی وا نییە.. ئەوەش مافی خۆتەو ناتوانم هیچ قسەیەکی تیا بکەم.

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٨٤٦ – ڕ/ د- ناو سەیارەی شاموراد:

(( شامورادو ئدریس لەناو سەیارەدان، لە شوێنێک وەستاون))

شاموراد(( توڕە)): نا کاکە نا، کوشتنی چی؟ سەدجارم پێوتووی من پیاوی کوشتن نیم.. هەر لەگەڵیا ئەچین بۆ شوێنێک پاشا دیاریی ئەکا، لەوانەیە لەوێوە نەهێڵن بچین لەگەڵیانا، پاشا ئەوەندە چەکداری زۆرە، چۆن ئەهێڵێ من و تۆ جێگەکەی بزانین.

ئدریس: بۆ لەگەڵ سمکۆ ڕێککەوتوون گەورەم؟ یان سمکۆش فت؟

# (( ئەڵقەی چل و یەک))

شاموراد: ئەوە پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە، یاڵڵای ئەکرد کوت کوتی ئەکرد، کەڵەگایەک کەمتر باشترا!

ئدریس: کە گوناحە!!!!!!

شاموراد: کێ؟

ئدریس: ئەو سمکۆ نەگبەتە.

شاموراد: ئەی خۆ لە خۆڕایی یەکەم ڕۆژ ناوم نەنا نەگبەت.. خۆم ئەمزانی عاقیبەتی چۆن ئەبێ.

ئدریس: کەی خۆم ئامادەکەم گەورەم؟

شاموراد: نازانم، پاشا پێیوتم لەم ڕۆژانەیا ئامادە بن، وتی تۆو ئەو کوڕەی لەگەڵتایە، بیهینن بۆ شوێنێک دواتر شوێنەکەت پێ ئەڵێم، لەوێ تەسلیمی پیاوەکانی منی بکەن.

ئدریس: هەر خۆی؟

شاموراد: نازانم، ئەوە ئیشی ئێمە نییە.

ئدریس(( دەرگا ئەکاتەوە دابەزێ)): باشە گەورەم ئامادە ئەبم.

دیمەنی – ٨٤٧ – ڕ/ن – ماڵی ئاکۆو گێلاس:

(( نینا تێل ئەکا ))

نینا (( خەندە )): ئمممم.

ئاوا (( دەنگ )): شێت و وێت!!

نینا: ئەی توخوا ئەگەر شێت نەبوومایە، چۆن ئەگەڕامەوە بۆ لای شێت و قوربانیم بۆ ئەدا؟

ئاوا: هێشتا تۆش قوربانیت بۆ من داوە؟ تەح!!!

نینا: ئەی چۆن شتەپیس؟ من وەسێتەکەی باوکم شکاند!! بۆ نازانی؟

ئاوا: ئەها، ببورە بیرم لای ئەوە نەبوو، ڕاست ئەکەی.. بەڵام تۆ بەو بێدەنگیی و دوورە پەرێزیی و خۆشاردنەوەیەت، جەهەنەمت بۆ من هەڵکردبوو.

نینا: دەی ئێستا هەموو شتێ گەڕایەوە جێی خۆی و کاتی دەردەدڵ نەماوە، با کەمێ بچینە دەرەوە.

ئاوا: من خەوتووم لەناو جێدام، وەرە هەڵمسێنە.

نینا: هههە ئەی چۆن؟.. هەموو کاتێ بۆ شێتەکان هەر یەک کاتەو ئەبێ خۆیان بنوێنن.. کەسی لێ نییە؟

ئاوا: وابزانم دایکە سەرخڕەکەم هێشتا نەڕۆشتووە.

نینا: مادام ئەوی لێیە، بە پەلە خۆم ئەگۆڕم و وا هاتم.

Cut

دیمەنی – ٨٤٨ – ڕ/ د – سەرجادەی بەردەمی چایخانەکە:

(( ئەردەڵان عەرەبانەکەی ڕاگرتووەو نزیکەی سەد هەزارێکی بەدەستەوەیە ئەیژمێرێ ))

ئەردەڵان(( دوای ژماردن ئەیخاتە گیرفانی شەرواڵەکەیەوە)): خێرو بەرەکەت ڕژاوە.. ئەک خوا نەیبڕێ.. وەڵا ئەم کاکە ڕەوەزە وا بکا، مانگێکیتر نابا ئەبم بە حمە تەڕەماش.. ئای (( بە دەنگی قورس و قەڵەو)) کاک حمە خدر، حەماڵ بوو وەک خۆم، ئێستا کەرێ نازی ناکێشی، ئۆهـ خوای گەورە پێی بگەمەوەو تۆزێ خۆمی بەسەرا بادەم.. ئەرێ بەڕاست دیار نییە!!!

(( عەرەبانە پاڵ ئەنێ بەرەو لای هاوڕێ ))

ئەردەڵان: خوا بازاڕت با.

هاوڕێ(( لالووت)): بەخێر بێی!

ئەردەڵان: هیچی نەداومەتێ، خێرا کردمت بە چاوەوە.

هاوڕێ: بینیم بەدەستەوە.. ئەگەر ئەو پارانەی ئەو هەتیوە.........

ئەردەڵان(( قسەی پێ ئەبڕێ)): مەڵێ هەتیو.. بڵێ کاکە ڕەوەز.

هاوڕێ: ئەگەر پارەکانی سەری نەخواردی، هیچم نەزانیبێ.

ئەردەڵان: جا تۆ لە چا تێکردن زیاتر، چیترت زانیوە پێم ناڵێی؟ بێنە بێنە چایەک بێنەو فززەت لە دەمەوە نەیەت.

هاوڕێ(( پشتی تێ ئەکا بۆ چا تێکردن)): ئێهـ ئەتبینمەوە.

Cut

دیمەنی – ٨٤٩ – ڕ/ د – بەر ئۆفیسی گێلاس:

((گێلاس لە ئوتێلەکەوە دێتە دەرەوەو کەمێک سەرنجی سەیارەکەی ڕاماڵ ئەدا کە ڕاماڵ و سەرچڵی تیادان و دێن لەبەر ئۆفیسەکەی ئەوەستن، گێلاس بە تیلە چاو سەرنجیتر ئەدات و ئەچێتە ژوورەوە))

ڕاماڵ: مەترسە با ترس بە ڕوخسارتەوە دیار نەبێ سەرچڵ گیان.. نۆرماڵ وەریگرە، وەک هەر کەسێکیتر کە ڕیکلام بۆ کاری خۆی ئەکا، ئەوان چوزانن مەبەستمان چییە؟

سەرچڵ: کورە ئەوە تۆ ئەڵێی چی ڕاماڵ، ژن زۆرزانن، ئەوەت بینی ئێستا چووە ژوورەوە؟

ڕاماڵ: بۆ ئەو گێژە ئاگای لە خۆی بوو تا لە ئێمەی بێ؟

سەرچڵ: دەی باشە وا ئەچم، بەڵکو ئەمجارەیان شتێ بە شتێ بکەین.

(( دائەبەزێت و ئەچێت بۆ ئۆفیسی گێلاس))

تابع ________ Cut ________

دیمەنی – ٨٥٠ – متبوع – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( سەرچڵ دێتە ژوورەوەو سڵاو و وەڵام، چاوبزیی لەگەڵ تیرۆژا ئەکا))

گێلاس: فەرموو کاکە!

سەرچڵ: ڕاستییەکەی ئێمە ڕێکخراوێکین هەلی کار دابین ئەکەین، ئەمەش کارتەکەمانە ئەگەر کەسێک پێویستیی بە کار بوو، ئێمە دابینی ئەکەین.

تیرۆژ: بەڵێ کارتەکەمان لایە، چەند ڕۆژێک پێش ئێستاش هاتی.

سەرچڵ: ڕاستییەکەی لەبەرئەوەی ئێمە زۆر ئەگەڕێین، بیرمان ئەچێتەوە چەند شوێن چووین، زۆر سوپاس کە ئاگادارت کردمەوە، کەواتە ئەو دوکان و بازاڕەی تریشم دووبارە کردۆتەوە.

گێلاس: ئەها، یەعنی لەم ڕیزەیا ئەمە یەکەم شوێن نییە هاتبی؟

سەرچڵ: نەخێر خانم گیان، وا ئاوی پێم دایەت، هەموو ئەو شوێنانەیتریش گەڕاوم.

گێلاس: باشە کاکە گیان دەستخۆش، ئەگەر کەسێک پێویستی بە کار بوو، ژمارەکەتی ئەدەینێ، جارێ کەس شک نابەین.

سەرچڵ: من ناوم سەرچڵەو ئەوەش ژمارەی خۆمە، هەر کاتێ تەلەفونتان بۆ کردم لە خزمەتدام.

تیرۆژ: سوپاس کاک سەرچڵ.

_____ گەڕانەوەی هەیە _______________ Cut _____________________

دیمەنی – ٨٥١ – ڕ/ن - ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا لەسەر نەخشەکە قسە بۆ نیگار ئەکا ))

شەنیا: هیچی خەتای نە ئێمەو نە کرێکارەکانمان نییە.. هەڵەی ئەندازیارەکەی خۆیەتی.

نیگار: نا لە سویچ پەناڵەکەیا هەڵەی ئێمەیە، لە عەقدەکەیا چینکۆکە گێچی ٧٠یە ئێمە گێچی ٤٠ مان داناوە، بەسەر تۆشا تێپەڕیووە.

شەنیا: من بە کاک ڕەمزیم وت، وتی ئامۆ پێی ڕازییەو خۆی بەرپرسیارە.

نیگار: ئای ئامۆ!! بەوە ڕازییە، کەچی هەموو محاجەرە ئاسنەکانیشمان پێ ئەگۆڕێ بە ستیل.

شەنیا: کەواتە هەردوو زەرەرەکە ئەکەوێتە سەر ئامۆ.

(( ڕەمزی دێتە ژوورەوە، گرژە ))

ڕەمزی: ئەندازیارەکە تەلەفونی کرد، ئەڵێ غەرامەی دواکەوتنتان لێوەرئەگرین لە سویچ پەناڵەکە، ئێوە پارەی گێچی ٧٠ تان وەرگرتووە، هیچ قسەی تیا ناکرێ، من ئەندازیارم نەک کاک ئامۆ.. منیش وتم کەواتە محاجەرەکان عەقدی تازەی بۆ ئەکەین چونکە ئەکرێ بە ستیل، منیش هەقم بەسەر لێکردنەوەو فڕێدانی ئاسنەکەوە نییە.

نیگار: ئەک دەستت خۆش بێ.

ڕەمزی(( بۆ شەنیا )): ئەی جەناب تۆ نەبینیوە کە ژووری کاک زوبێرو ژوورەکەی کاک ئامۆ ئەبێ pvc و پلاستیکی ساجیی بێت؟ یان کوێراییت داهاتبوو هەموویت بە سپی بینیوە؟ تۆ ئەزانی جیاوازی نرخەکەیان چەندە؟ بۆ حەیامان ئەبەی؟

شەنیا: نا، تەرکیزم نەبوو، ببورە لەسەر موچەی خۆم چاکی ئەکەمەوە.

ڕەمزی: ئەبێ سپێیەکان فرێدەین.. پارەی هەموو ئەوە لەسەر خۆتەو نیگارخان لە مووچەکەی بە قیست بیبڕە. نیگار: کاکە ئەمجارە ئەوە عایدی خۆم، ئەوەندەش توندوتیژ مەبە لەگەڵیا.

ڕەمزی: توندوتیژیی نییە نیگار خان، نابێ ئەو پارەیەش تۆ بیدەت.. ئیشی ئێمە هەروایە.. ئەکرێ لێی ببڕین و ئیتر خۆت ئەیدەیتەوە یان نا؟ ئەوە پەیوەندیی بەئیشەکەوە نییە.

شەنیا: بەڵێ باشە کاک ڕەمزی بەسەرچاو، هەڵەی منە، هەرچەند جیاوازییەکەش ئەوەندە نییە.

ڕەمزی: صاجیی ١٢ دۆلارەو سپی ٧ دۆلار.. ئەوە بۆ ئەوەی خۆت بزانی چەنندت لێ ئەبڕرێ، خۆت ڕەدەڵ و بەدەڵی بکە. (( ئەچێتە دەرەوە))

شەنیا(( دوای ڕۆشتنی ڕەمزیی بە خەندەوە)): ئەوە بۆ ژنێکی بۆ ناهێنن و لەو شپرزەیی و ئاڵۆزییەی کەم بکەنەوە؟

نیگار: مەگەر تۆی بەمێ!

شەنیا: ئۆووو من؟؟؟؟ سەدی وام بۆ کەڵەکەکەن لەسەر یەک هەر ئاوڕیشیان لێ نادەمەوە نیگار خان.

نیگار: فەرموو ئیشەکەم بۆ تەواوکە ئەوەنە بەرز مەفرە.

(( لە میوتیدا تەماشا کردنی نەخشەو دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٨٥٢ – ڕ/ د - بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن دێت و دەرگا لە نینا ئەکاتەوەو ماچکردن و هەواڵ پرسین))

نارەوەن: بەخوا زۆرم پێخۆشە پێکهاتنەوە، تۆش وەک من نەگبەتی، هەرچیمان بەسەر هاتووە لەیەک ئەچێ، دوور بێ لە ئاوا گیان.. زۆر سەیرە منیش ڕۆشتنی باوک و برام هەر وەک تۆ بوون، ئەگەر بەمزوانەش ئیشەڵلا بتگوێزینەوە، شووکردنیشمان هەروەک یەک ئەبێ.. بەخوا ڕۆڵە منیش شووەکەم بە باشتر زانی لە سەرماڵان، هیچ نەبێ بە ئیسراحەتی خۆم قاچم تیا درێژ ئەکرد.

نینا: خوا عافویانکا، تازە ناگەڕێنەوە.. ژیانیش هەر بەردەوامە.. بابزانین چۆن ئەبێ.

نارەوەن: ئیشەڵلا خوا زوو ڕێکیخاو زوو بچنە ماڵ و حاڵی خۆتانەوەو پێکەوە تەباولەبا بن تا ئەخیری عومرتان.. بەخوا تۆ شایستەی باشترینی و بە دەمی خۆشم نەڵێم کوڕەکانم نمونەیین.

نینا: زۆر سوپاس، خوا کوڕەکانت بۆ بهێڵێ.

نارەوەن: دەفەرموو بچۆ ژوورەوە خۆت پەلەی خۆگۆڕینی لێ بکە.

نینا: زۆر سوپاس، ئەگەر زەحمەت نەبێ پێی بڵێ تۆزێ زوو بێت.

نارەوەن: ئەوە چییە ئەو قسانە؟ (( بەسوعبەتەوە)) دەی پێشم بۆ ژوورەوە دەی!!.. ئیتر ئێرە ماڵی باوکی خۆتەو بەخوا ئەتهێنمە سەرماڵ بە قوربانت بم، ئەبێ ژیانی تۆ زۆر خۆش بێ.

نینا: دەستت ماچ ئەکەم زۆر سوپاس، هەر بەخاوەن ماڵ بن یاخوا.

نارەوەن: دەی پێشمکەوە بۆ ژوورەوە.

(( نارەوەن نینا پێش خۆی ئەدا بۆ ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٨٥٣ – ڕ/ن – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٨٥٠ - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و تیرۆژ لە ئۆفیس دانیشتوون))

گێلاس: نەمویست بە درۆی بخەمەوە، ئەگینا ئەو کاتەی کە هاتمە ژوورەوە خۆم بینیم تەنیا نەبوو.

تیرۆژ: کەمێ چاوبزیش بوو هههە.

گێلاس: لەگەڵ تۆیا کەمی چی؟ هەر زۆر زۆریش.. کچەکە شتێکت نەبێ لەگەڵیاو بە منت نەوتبێ.

تیرۆژ: نە بەگۆڕی باوکم هەر ناشیناسم.

گێلاس: گاڵتەت لەگەڵ ئەکەم، جا وا ناسیبێتت، چ پەیوەندییەکی بە منەوەیە؟

تیرۆژ: نا من لێرە لە هەموو شتێکی خۆم ئاگادارت ئەکەمەوە.. خوا ئەیزانێ وەک دایکی خۆم و دڵسۆزتریش سەیرت ئەکەم گێلاس خان.

گێلاس: خوا دایکت بۆ بهێڵێ یاخوا.

(( سەرقاڵ ئەبن))

Cut

دیمەنی – ٨٥٤ – ڕ/ د – بەرئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە بە سەیارە جیبەکەی خۆی دێت و لەبەردەم ئۆفیسدا ئەوەستێ و دائەبەزێ.. لە دابەزیندا ئەبێ نارەوەنیش پەیا ئەبێ و سلاو و وەلام))

نارەوەن: ئەوە خێر دایە گیان بەم بەیانییە؟

تریفە: بازاڕێک ئەکەم، حەزمکرد سەرێکت بدەم و پێت بڵێم ئەو هەتیوەی مێردم دوو شەوە بیری ماڵیشی نەماوە.

نارەوەن: نایەتەوە؟

تریفە: نەوەڵا مۆبایلیشی داخستووە.

نارەوەن: ئاخر چۆن وا ئەبێ ڕۆڵە؟ بۆ نایەیتەوە لای خۆمان، با کاتێ گەڕایەوە بزانێ ماڵت بۆ چۆڵکردووە.. بەخوا ئامۆو ئاوا بزانن، ناهێڵن یەک شەو لەو ماڵەدا ڕۆژکەیتەوە.

تریفە: نا توخوا پێیان مەڵێ، لەبەر حەیاکەم نامەوێ ببمە بنێشتەخۆشەی ژێر دانی خەڵک.

نارەوەن: دەی ئاواش ناگوزەرێ ڕۆڵە.

تریفە: ئەی چی بکەم؟

نارەوەن: خۆ نەمردووە، تۆ بڵێی نەیبینمەوە؟

تریفە: ئۆف خۆزگە بمردایەو لە کۆڵم بووایەتەوە بەبێ وەی و بەڵا.

نارەوەن: وەرە تۆزێ دانیشە، بزانین دەستمان ناکەوێ؟

تریفە: نەوەڵا دەست ناکەوێ، هەر مۆبایلەو ئەویشی داخستووە.

نارەوەن: باشە تۆ بچۆرەوە بۆ ماڵەوەو هەندێ جلوجۆر بێنە، تا ئەگەڕێتەوە، ئەوسا بە مەجبوریی با خۆی بۆت بگەڕێ.

تریفە: بەخوا وا بەکەڵک نایەت دایە گیان.. بابێتەوە، ئەوسا خۆم حەق و حسابێکی باشی لەگەڵ ئەکەم.

نارەوەن: ئەگەر خۆت بتکردایە دەمێک بوو کردبووت، باوەڕم بە حەق و حسابی خۆت نییە.

تریفە: نا نا ئەمجارە گوڕم داوەتە بەرخۆم، تەواو یەکلای کەمەوە.

نارەوەن: ئەی پەلەی بازاڕت چییە جارێ؟

تریفە: بەڵکو ئەمە خوایە زوو بگەڕێتەوە، ئەڵێم با لەماڵەوە بم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ٨٥٥ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەوەز لە ژووری ئاوادایە، کەسی لێ نییەو تێل ئەکا ))

ڕەوەز: نا نەهاتووە جارێ............. خەمی ئەوەت نەبێ، کە من بمەوێ شتێک بکەم هەر پرسیشی پێ ناکەم، دەستکراوەی کردووم بۆ هەموو شتێک..................... هەر گاڵتەشم پێ نایەت، ئەوە هەر هیچ نییە، کێشەکەم تەنها ئەو پیرەمێردەیە......... ئا ئا مام لەتیف، چارەسەری زۆر ئاسانە......... تۆ بۆم بنێرەو تەنها لە کاتی گەیشتنی ئاگادارم بکەرەوەو هیچیتر.......... (( پێکەنینی بەکوڵ)) بەڵێ خۆم پاسپۆرتی بۆ دەرئەکەم......... باشە گیان، خوات لەگەڵ.

(( دوای تەلەفونەکە))

ڕەوەز: ئای ڕێویەپیر؟؟؟؟!!!!!

Cut

دیمەنی – ٨٥٦ – ڕ/ د – سەر عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ و یەکێک لە خزمانی وەستاون))

خدر٣: بەرنامەکەت لە عەقید بەهێز وەرگرت؟

خزم: بەڵێ قوربان، تەنها ئەو پێنج کەسە لەگەڵتا ئەبن، کە پاشا وتویەتی، ئەوانیتر بە سەیارەیتر دوورو نزیک دواتان ئەکەون.

خدر٣: سەعات ٤ ی تەواو دێن بە شوێنما، ئێوە لە دووەوە ئامادەبن، نەک تاکتیک بێ دیسان!

خزم: لە دوانزەوە ئێمەو هێزەکەی پۆلیسیش چاوەڕوانی ئاماژەی خۆتین.

خدر٣: بەڵام ئەو سەیارەیەی بۆ چوونی من دانراوە، با پێنجی بوێ بۆ چوار بێتە تەنیشتمەوە.

خزم: بەڵێ وا ئەکەین.

خدر٣: باشە کاکە بچن بەلای ئیشتانەوە.

(( ڕۆشتنی خزم و بانگەوازەکەی خدر٣ بە شێوازی خۆی))

Cut

دیمەنی – ٨٥٧ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان نەخۆشە، باڵاو کڵپە لەفافی بۆ لە ئاوی سارد هەڵئەکێشن و ئەیخەنە سەر ناوچەوانی.. پاش کەمێک هەندرێن دێتەوە))

هەندرێن: هەستە ژنەکە دەی، قەزات لە من ئەوە سەیارەم هێناوە.

تافان(( بە نقەنق)): ناتوانم نەخوا لێمگەڕێ با بمرم.

هەندرێن: نا بەساقەوبم چۆن ئەهێڵین بمری؟

تافان: ئەی وایە کارەکەرێکی باشتان ڕاگرتووە، ئیتر بۆ بمرێ.

باڵا: دەهەستە دەی هەستە بچۆ بۆ خەستەخانە، با چاک بیتەوە.

تافان: بەخوا لەبەر خاتری ئێوە ئەچم، ئەگینا تا ئەمرم ئەمە جێم ئەبێ، وەک دابەستە لە ماڵەوە بە گوریسێکەوە بەستوومیەوە، بزانن هەوڵی ئیشێکم بۆ ئەدا.

هەندرێن: تۆ جارێ هەستە با چاک بیتەوە، دواتر هەوڵی ئیشیشت بۆ ئەدەم.

کڵپە: دەی توخوا هەستە دایەگیان.

(( هەرسێکیان دەستی ئەدەنێ و هەندرێن ئاگاداری مناڵەکان ئەکاتەوە ئاگایان لە ماڵەکە بێ))

Cut

دیمەنی – ٨٥٨ – ماڵی بروسک:

(( زوبێرو چیمەن، تەواو سکی بەرزە ))

زوبێر: پێموتی تا بروسک دێتەوە لێر ئەبی و بڕایەوە، بۆ هەردووکمان باشترە، خۆ ئیتر وا ڕێککەوتووە من تا مردن هەر تەنیابم، ڕاستییەکەی خراپیش نییە خۆم پێمخۆشە.

چیمەن: باشە لێرە ئەبم، بەس تۆش ئەبێ بە قسەم بکەیت و ژن بێنی، وا من ڕۆشتمەوە؟

زوبێر: باشە بە قسەت ئەکەم.

چیمەن: هەر هەستمەوە سەرپێ و بتوانم چاو بگێڕم، ژنێکی جوانی وات بۆ ئەدۆزمەوە. شایانی خۆت بێ.

زوبێر: لێت نەشارمەوە، ئەقڵم ژنێک ئەبڕێ و بەدڵیشمە.. ئەمە وەک کابرا وتی نیوەی کارەکە مەیسەر بووە. هههههه نیوەکەی تریشی لەسەر ئەوە ڕازی بێ. هههه

چیمەن: ئای لە باوکە گیانم، بە دزیی منەوە نیوەی تەواو کردووە، ئینجا پێم ئەڵێ.

زوبێر: کچێ گاڵتەم کرد، مەبەستم ئەوە بوو، نیوەی ئەوەیە ئەو ڕازیی بێ و نیوەی من، ئێ ئەوەی من تەواو بووە، ماوەتەوە سەر نیوەکەی ئەو هههه.

چیمەن: جا حەددی چییە بە باشترین و ڕۆشنبیرترین پیاوی ئەم شارە ڕازیی نابێ؟.. پارەیە زۆرەو ماشەڵڵا بێچاوێنیی بیت زۆر جوانیی و زۆر شت ئەزانیت و لەخوا بەزیاد بێ هەموو شتێکت بە زیادەوە هەیە.. من ئەیناسم؟

زوبێر: نا باوەڕ ناکەم.. بەڵام بە پێی ئەوەی کچەکەی گەورەیەو خۆی شووی نەکردۆتەوە، باوەڕ ناکەم نیازی شووکردنەوەی لە مێشکا بێ.. ئەگینا ئۆو ئەوەندە جوان و کەشخەیە، ئەو جۆرە قەت دانامێنن.

چیمەن: ناوی چییییییە؟ لە کوێ بینیوتە چاوباشقاااااڵ؟ ئادەی بزانم!

زوبێر: هههه من و چاوباشقاڵیی؟ بەڵام ئیتر (( خۆی داماو نیشان ئەداو سەر ئەبا بەملا)) ئێوە زۆرم لێ ئەکەن، ناتوانم قسەتان بشکێنم.

چیمەن: کە داماوی.. تۆۆۆۆۆۆۆ؟

زوبێر(( خەندە)): بۆ چیت لێ بینیوم ڕۆڵە؟

چیمەن: هیچم لێ نەبینیوی، بەڵام فەقیریش نیت هههه

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٨٥٩ - ڕ/ د - بەردەم ئۆفیسێکی چۆڵ:

(( ڕامآڵ و سەرچڵ وەستاون))

سەرچڵ: کچەکە جوانە خراپ نییە.

ڕاماڵ: ئەگەر بە دڵتە هەموو شتێکی هاوسەرگیرییەکەت لەسەر من.

سەرچڵ: نەوەڵا ڕاماڵ گیان لەو ستایلە نییە من حەزی لێ ئەکەم، ئەمە ئیشەو بۆ تۆو بەس.. ئەگەر کەوتینە قسەوە لەگەڵ دڵنیا، بیریێ لە ژنهێنان ئەکەمەوە.

ڕاماڵ: ئەوە هەر زۆر ئاسانە سەرچڵ گیان، حەز ئەکەی من بە دەورانی هاوڕێم ئەڵێم، شتێکی لەگەڵا باس بکا، ئەوە لەسەر من.

سەرچڵ: دەی وەڵا هەزارجار، تۆ ئەوەم بۆ بکە ڕاماڵ، بەڵێن بێ چیت بوێ بە خوشکەکەی ئامۆی ئەکەم.

ڕاماڵ: بۆ هیچ سەرنج و شت دروست بوو؟

سەرچڵ: جارێ نا، بەس لاریم نییە سەدجاریتر ئەچمەوە سەری تا وای لێ ئەکەم خۆی بێتە سەر خەت.

ڕاماڵ: لێت ناترسم سەرچڵ گیان خۆت شارەزای.. هەر ئێستا تەلەفون بۆ دەوران ئەکەم ئێوارە بیبینم.

سەرچڵ: قوربانت.. ئەی ئەم بە ناو ئۆفیسە هیچی تێ نەکەین؟

ڕاماڵ: نا ئەزانم خەمی ئەوەتە دڵنیا لێرە بتبینێ.. هەر دوو کورسیی و مێزێکی ڕەق و تەق بێ، ئەگەر ئەو هات، بچۆرەوە بۆ ئۆفیسەکەی خۆت، باوەڕیش ناکەم بێتە ناو ئەو هەموو پیاوە، لە دەرەوە یەکتر ببینن باشترە.

سەرچڵ: نە بابە ئێرە زۆر لە مەعرەز باشترە.

(( ڕاماڵ مۆبایلی دەرهێناوەو تێل ئەکا)) ________________ Cut ______________

دیمەنی – ٨٦٠ – ڕ/ د – سەر عەرەبانەی خدر٣:

(( خدر٣ سەیارەیەکی بەرز لە تەنیشتیەوە وەستاوە.. نۆکاو یان پاقلە بۆ کەسێک دائەنێ، سەیارەکەی شاموراد دێت و لەو دیویەوە ئەوەستێ، خدر٣ نۆکاوەکە جێ ئەهێڵێت و بەرەو سەیارەکەی شاموراد ئەچێ، یەک لە خزمانی دێتە سەر نۆکاوەکەو، چوار کەس ئەچنە سەیارەکەی پێشتر لە تەنیشتییەوە وەستابوو))

خدر٣ (( بۆ شاموراد )): ها! شاموراد! ئامادەن؟

شاموراد: دوامانکەون با بڕۆین.

(( خدر٣ بە شێنەیی دێت و لە پێشەوەی سەیارەکەی ترەوە دائەنیشێت.. سەیارەکان ئەڕۆن و پاش کەمێک دوو سەیارەیتریش دوایان ئەکەون))

Cut

دیمەنی – ٨٦١ – ڕ – عەسر/ د – بەردەمی ماڵی نیگار:

(( دەوران لە ماڵ دێتە دەرەوەو ئەیەوێ بچێتە سەیارەکەیەوە، دایکیشی بە سەیارەی خۆی دێتەوە.. دائەبەزێت و ئەگاتە دەوران ))

دەوران: باشی؟

نیگار: ئا، من باشم ئێوارە زوو وەرەوە لە دەرەوە نان نەخۆی.

دەوران: ئاگادارم ئەو کچە داماوەت کردووە بە فڕفڕۆکە پەردەپڵاو لێ بنێ، داماوە هەر مرد ئەوەندە هاتوچوو.

نیگار: بە سەعاتێ بۆت لێبنێم و نیوەی ئەویش هەڵنەسوڕێم؟ .. ئای خوایە ئێوە گیانی خۆتان خۆش ئەوێ.

دەوران(( سوعبەت)): دەی باشە بەس تیروتوانجمان تێگرە، زوو دێمەوە، ڕاماڵی هاوڕێم ئیشی پێمە، بزانم چی ئەوێ.

نیگار: دەبڕۆ ئاگات لە خۆت بێ.

Cut

دیمەنی – ٨٦٢ – ڕ- عەسر / د – کۆگایەکی ڕاقیی جلوبەرگ:

(( ئاوا وەستاوەو نینا ئەگەڕێ و پارچەیەک جلی ڕەش))

نینا: ئەمە چۆنە ئاوا؟

ئاوا: گیان و دڵی ئاوا، تۆ چیت پێ باش و جوانە، لەوە جوانتر نییە.

نینا: سوپاس.. بەڵام ڕای تۆم ئەوێ.

ئاوا: دیزاینەکەی زۆر عەجیب جوانە.

نینا: یەعنی ڕەنگەکەیت بەدڵ نییە.. بەڵام دڵنیات ئەکەمەوە ئەمە پەیوەندیی بە تازێبارییەوە نییە، ٢٠ساڵیتریش بمبینیایە، هەر هەڵمئەبژارد.

ئاوا: دەی کە پەیوەندیی بەوەوە نییە، پیرۆزت بێ.

نینا: بەس خۆم پارەکەی ئەدەم.

ئاوا: لە ئێستاوە تا من بژیم، ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆ پارە نادەی تێگەیشتی؟ لە هیچ کاتێکاو بۆ هیچ مەبەستێک.. ئەمەت لەبیر بێ.

نینا: ئەی ئەگەر بمەوێ من دیاریت بۆ بکڕم؟

ئاوا: تەنها ئەو حاڵەتەو بەس.. ئەی هەر ئەوە هەڵئەگریت؟

نینا(( خەندە)): ئەوە کەم نییە با بزانی زۆر گرانە (( نرخەکەی پێ نیشان ئەدا)) ئەها!

ئاوا: ئەتوانی هەموو دوکانەکە هەڵگریت و نەڵێی گران بوو.

نینا: حەز ئەکەم وابێ، هەر ئەمەو بەسە.

ئاوا: بە دڵی خۆت.

(( بەرەو لای کاشێرەکە ئەچن)) ـــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٨٦٣ – ڕ- دەمەو ئێوارە – سەر ڕێگەی دەرەوە:

(( سەیارەی شامورادو سەیارەی خدر٣ بەڕێگادا ئەڕۆن و دوو سەیارە ئەبینرێت، لە بەردەمیانا ئەوەستن.. شاموراد دائەبەزێت و ئەچێتە لایانەوە.. لە سەیارەکەدا خەلیل و ئاسۆو نیزام و خاوەن خانووە مەفروشەکەو کەسێکیتر هەن))

شاموراد: پێنج کەسن ئەوەتان.

خەلیل: باشە ئێوە بگەڕێنەوە.

شاموراد: ئەوەی پێشەوەیان سمکۆیە.

خەلیل: ئەیناسم، زۆر مەڵێ و بڕۆ.

شاموراد: باشە گەورەم خواحافیز.

خەلیل(( بۆ شۆفێر)): دەرچۆ.

(( شامورادو ئدریس ئەگەڕێنەوە، سەیارەی خدر دوای دوو سەیارەکە ئەکەوێ.. پاش کەمێک دوو سەیارەکەیتریش دەرئەکەون و دوایان ئەکەون))

——— تابع ——————————— Cut ———————————

دیمەنی – ٨٦٤ – متبوع – ڕ- ئێوارە – د – سەر ڕێگەی دەرەوە:

(( لە گەڕانەوەیاندا شامورادو ئدریس، لە پێچێکدا ئەکەونە بۆسەی هێزێکی پۆلیسەوە، ژمارەیان لە دوو سەیارە کەمتر نەبێت، عەقید بەهێز بە دەمانچەیەکەوە لە پێشیانەوە وەستاوە، دەستیان لێڕائەگرن و ئەوەستن))

شاموراد: سڵاوتا لێ بێ برایان ماندوو نەبن؟

بەهێز(( پشتە ملی ئەگرێت و تووڕە)): ئا تۆ وەرە خوارەوەەەەەە!

(( شامورادو ئدریس ئەپارێنەوە کە هیچیان نەکردووە))

بەهێز(( بۆ ملازم ئاری)): بە درۆنزەکە شوێنەکە دیاریکە.

(( " درۆنز/ فڕۆکەیەکی بێ فڕۆکەوان کامێرای لێ بەستراوە" بە ئاسمانەوەیە))

ئاری: گەورەم وا نزیکی باخێک بوونەوە ڤێللایەکی تیایە، لە ناو چەند باخێکیترا.

بەهێز: وەرە تەنیشتم سەرکەوە شوێنەکەمان لێ ون نەبێ.. (( بۆ پۆلیسەکان)) دەرچن.

(( هەموو سەرئەکەون و بەهێزو ئاری ئەچنە سەیارە فۆردە بەرزەکەی پۆلیسەوە))

Cut

دیمەنی – ٨٦٥ – ڕ – ئێوارە/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( مام لەتیفی تەمەن ٥٥- ٦٠ ساڵ بە جلی کوردییەوە لە کۆمپانیا دێتە دەرەوەو پاش کەمێک ڕەوەز بە پەلە دێت و دەست ئەخاتە سەرشانی و ڕایئەگرێ))

ڕەوەز: بۆ کوێ مام لەتیف؟ ئەمڕۆ زۆر ماندوو بوویت، ئەڕۆیتەوە؟

لەتیف: نەوەڵا کاک ڕەوەز، کاک ئاوا پێیوتووم تا ئیش هەبێ نەڕۆیتەوە، ئەوە بارێک هاتووە ئەچم ئەیپشکنم.

ڕەوەز: نا ئاگام لێتە ماندووی، ئاوا نایەتەوە من لە بری ئەو لێرەم، تۆ بڕۆوە بۆ ماڵەوە خۆم ئەیپشکنم، گوناحی.

لەتیف: ئەوە نابێ کاک ڕەوەز، کاک ئاوا پێیوتووم ئەگەر خۆشم بارێک بپشکنم، هەر شتێکی تیابوو، بەرپرسیارێتییەکەی لە ئەستۆی تۆدایە.. کابراش زۆر باشە لەگەڵما خوا هەڵناگرێ، جا بۆ توشی عەیبەیەکیش ببێ.

ڕەوەز(( گرژ)): بۆ من توشی عەیبەی ئەکەم مام لەتیف؟ توخوا ئەوە قسەیە تۆ ئەیکەی.؟

لەتیف: نا نا خوانەخواست مەبەستم جەنابت نییە.

ڕەوەز: مادام من توشی عەیبەی ئەکەم، فەرموو عەرەبانەکەت ڕاکێشەو بچۆرەوە بۆ ماڵەوە، خۆم ئەیپشکنم.. پشکنین ئەبێ چی بێ؟

لەتیف: ئاخر تا ئێستا هەر خۆم ئەوەم کردووە.

ڕەوەز(( توڕە)): پێموتی بڕۆو زۆر مەڵێ.

لەتیف: الحکم للە، بەڵام با خۆیشی ئاگادار بێ کاکە ڕەوەز.

ڕەوەز: کیشەی من نییە، خۆت تێیگەیەنە.

Cut

دیمەنی – ٨٦٦ – ڕ / ئێوارە / د – باخێک:

(( باخێکی ئەهلیی، ڤێللایەکەی تیایە، دوو چەکدار لە بەردەمیا وەستاون، سەیارەکانی پیاوی پاشاو سەیارەکەی خدر٣ دێنە ناو باخەکەوەو پاسەوانەکان، دەرگای باخەکە دائەخەنەوە.. هەموو دائەبەزن و چەکدارن، هەردوولایان جگە لە خدر٣. یەکێک پێشی خدر٣ و خزمێکی ئەکەوێت بۆ ژوورەوەو خدر٣ دوایان ئەکەوێت و ٣ لە خزمەکانی لە دوای پیاوەکانی پاشاوە ئەمێننەوە، کە ژمارەیان ٩ کەسێک ئەبێت، ئەمان لە دەرەوە ئەوەستن و ٣ خزمەکەی خدر٣ چەکیان ئاراستە کردوون و بەرامبەریان وەستان، بەڵام پیاوەکانی پاشا چەکیان ئاراستە نەکردوون و بە دەستیانەوەیە))

یەکێک/ پیاوی پاشا: هەهە چەکەکانتان داگرن هیچ ڕوونادا.

خزم: فەرمانی کاک سمکۆیە، ناتوانین بیشکێنین.

(( درۆنزەکە لە دوورەوە متابعەیان ئەکا))

تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٨٦٧ – متبوع - ئێوارە - ن – ژووری پاشا:

((ژوورەکەی پاشا نیمچە تاریکە.. پاشا ماسک یان توورەکەیەکی ڕەشی لەسەردایە، تۆنی دەنگی وەک تەلەفونەکانی لێ ئەکات و سەر زمانیش ئەگرێ.. خدر٣و خزمەکەی دێنە ژوورەوە.. زۆر بە گەرمیی تەوقەی لەگەڵ ئەکات و پێئەکەنێ.. خەلیلیش لە ژوورەوەیە، خزمەکەی خدر٣ لە لایەکی خەلیلەوە وەستاوە، وەک لە پشتییەوە وەستابێ))

خدر٣: هەر ئاوا دائەنیشی؟

پاشا: نا چۆن شتی وا ئەکەم.. پیاوی پیاوانە ڕووبەڕوو قسە ئەکا، ئەو قسەیەتم بیر ناچێ، هەر دوای ئەوە بڕیارمدا ڕووبەڕوو قسەت لەگەڵ بکەم، زیاتر لە دە جاریش ڕووبەڕوو قسەمان کرد.

خدر٣(( حەپەساو)): تۆ کێیت؟

پاشا(( قاقا لێدان بە دەنگی بەرز)): من؟؟؟؟؟؟؟

خدر: هەڵشۆ؟

پاشا(( پێکەنینی زیاتر)): وامئەزانی ئاقڵی سمکۆ، کەچی ترِی کەرێکت نەهێنا هاهاها.

(( خدر٣ خۆی هەڵئەداتە سەر مێزەکەی تا تورەکەکە لابداو ئەچێتە ئەودیوی مێزەکەوە.. خزمەکەی، چەک ئەخاتە سەر سەری خەلیل و چەکەکەی لێوەرئەگرێت، خدر٣ش دەمانچە دەرئەهێنێت و ئەیخاتە سەر سەری پاشا.. تورەکە لائەبات و.. (( بە سەرسوڕمانەوە)) چ ی ی ی چی!!!!!

# (( ئەڵقەی چل و دوو))

خدر٣: هەڵشۆ تۆۆ؟

هەڵشۆ(( بە هێمنیی)): دەمانچەکەت لابە سمکۆ با نەقەومێ.. چونکە تەنها تۆو خزمەکانت تیا ئەچن.

(( لە تاریکایی پشتی خدر٣ و خزمەکەیەوە دوو کەس بە دەمانچەوە دەرئەکەون و دەمانچە ئەخەنە سەر سەری خدر٣و خزمەکەی))

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______________________

دیمەنی – ٨٦٨ – ئێوارەی درەنگ/ د – بەر باخەکەی پاشا:

(( دوو کەسی خزمی خدر[٣] دێن و لە پشتەوە چەک ئەخەنە سەر سەری دوو پاسەوانەکەی بەردەرگاو چەکیان ئەکەن و بە هاوکاریی ئەوانەی دەرەوە دەرگای باخ ئەکەنەوە.. ئاماژەی ئەوانیتریش ئەکەن بێنە ژوورەوە.. دوواتر خزمان کە ژمارەیان نزیکەی ٣٠ کەسێکە، ئەچنە پشتی ڤێللاکەوەو لەوێوە دێنەوە بەرەو دەرگاکەی، ٣ خزمەکەی خۆیان کە ڕوویان لەوان و پیاوەکانی پاشایە، بە پەنجە ئۆکەی ئەکەن، کە بێنە پێشەوە.. دێنە بەردەمیان))

خزم: هەر کەس بجوڵێتەوە کوژراوە.

خزم ٢: دەستتان بۆ سەرەوە لەسەر تفەنگەکان نەبێ.

(( هەموو دەست بەرز ئەکەنەوەو چەک ئەکرێن و چەکەکانیان لێوەرئەگرن.. نزیکەی دە کەسێک لە خزمان بە هێواشیی ئەچنە ژوورەوە.. ئاماژەی ئەوانی دەرەوە ئەکەن هێمن بن.. پۆلیس بە بێدەنگیی ئەڕژێنە باخەکەوەو بەهێزو ئاری و چەند کەسێکیان بە حەزەرەوە ئەوانیش ئەچنە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٨٦٩ – ئێوارەی درەنگ / د – باخی قاوەخانەیەک:

(( دەوران و ڕاماڵ دانیشتوون ))

دەوران: ویش کە زۆر ئەیڵێیتەوە، شەنیا دڵنیا.. دڵنیا شەیدا.. ئەرێ ئەوە چیتە کابرا؟

ڕاماڵ: ئاخر بۆ دڵنیا ڕاسپێرراوم و بۆ شەنیاش خۆم بۆ ناگیرێ ناوی نەهێنم و باسی نەکەم.

دەوران: ئەها هەر خۆم داماوم کەسێکم نییە ناوم بێنێ؟ (( بە سوعبەتەوە نیشانەی گریان ))

ڕاماڵ: مەگری مەگری، خوا دەرووی بە خێری زۆرە.

دەوران: تێ ناگەم تۆ چۆن بۆ کەسێکیتر ڕامئەسپێری، کە ئەوی پێشووم بۆ نەکردبی؟

ڕاماڵ: دڵنیام هەر شتێکم بۆ ئەکەی.. مەگەر من مردبم ئەوسا دەستی لێهەڵئەگری و فشار ناخەیتە سەری.

دەوران: دەی با یەک شتی ڕاستت پێ بڵێم.. باوەڕ بکە کە دائەنیشین ناوی هەموو کەسێ ئەبەین کە ئەیناسین تۆ نەبی. (( هەڵئەسێ )).. پارەش بە دەی تۆ بانگت کردبووم.

ڕاماڵ: بۆ کوێ؟

دەوران: درەنگمە، وا شەوە ناگەمەوە ماڵەوە.. بای!

(( دەوران ئەڕوات و ڕاماڵش هەڵئەسێ حسابەکە ئەدا ))

Cut

دیمەنی – ٨٧٠ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٨٦٧ – ژووری پاشا:

(( خەلیل دەمانچە لە خزمی خدر٣ وەرئەگرێت و ئەیخاتە سەرسەری.. پاشاش دەست ئەبا بۆ دەمانچەکەی خدر٣

پێش ئەوەی دەستی بیگاتێ خدر٣ پەلاماری پاشا ئەدات و ڕووی پاشا ئەخاتە بەر دەمانچەی کابراو خۆی دەمانچەکە ئەخاتە سەر سەری))

خدر٣ (( بۆ خەلیل و چەکدارەکەیتر)): دەمانچەکانتان فڕێدەن با کەللەی نەپژێنم.

هەڵشۆ: دەمانچەکانتان دانێن سەگبابینە، شێتە لە دەستی دێت!

(( هەردووکیان دەمانچەکان دائەنێن))

خدر٣: ها هەڵشۆ کەرە، ئاوا قەوماندت؟

بەهێز(( دێتە ژوورەوەو پۆلیس و خزمان بە دوایەوە)): دەستخۆش کاک سمکۆ گیان.

خدر٣: گەورەم ئەم ترحێوە بوو پاشاکە هههە.

هەڵشۆ: سمکۆ تۆ پۆلیس بوویت سمکۆ؟ ئای خوایە کە دەبەنگ بووم.

بەهێز: بەڵێ دەبەنگ، کاک سمکۆ سات بەسات زانیاریی ئەداینێ، بۆ پێتوایە ئەقڵی پۆلیسیش لە ئەقڵە بچووکەکەی خۆت ئەچێت، تا بە ئاسانیی خەڵکی وەک کاک سمکۆت بۆ ئاشکرابێ؟ بێ ئەقڵ خەڵکی ئەم وڵاتە کە زانییان هاووڵاتیان ڕووبەڕووی دزو پیاوکوژو چەتەو مافیا ئەبنەوە، هەموو پۆلیسن نەک یەک و دووان.. کاک سمکۆش نمونەی بەرزی ئەوانەیە.. (( بۆ پۆلیس)) هەموو شوێنێ بپشکنن.. هیچ جێ نەهێڵن.

(( بەهێزو خدر٣ ئەچنە دەرەوەو پۆلیسیش هەڵشۆو پیاوەکانی پێش خۆیان ئەدەن))

Cut

دیمەنی – ٨٧١ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( سەلوا بە گریانەوە، چیمەن و زوبێر))

زوبێر: وا تێلم بۆ کردووە بێت بۆ ئێرە، بزانین چییە؟

سەلوا: بە خوا مامە بێ ئەوەی هیچ شتێک بووبێ، کە کاتی گەڕانەوەم هات لە دوکان، وتی نەچیتەوە بۆ ماڵەوە، بۆ هەر کوێ ئەچی بچۆ، ئیتر تۆ ژنی من نییت.

چیمەن: ئەوە ڕێژوان بۆ وای لێهاتووە؟ خۆ زۆر زۆری خۆشئەویستی.. سەیرە!!

زوبێر(( ڕامان)): بەڵێ سەیرە.. خۆزگە ژیان بە جۆرێک بووایە، هیچ شتێک تەم و مژاویی نەبووایە.. جا ئێوە بیهێننە پێش چاوی خۆتان چ دنیایەکی ئارام دروست ئەبوو؟ (( بە شێنەیی)) نە شەڕ... نە جەنگەکان و نە نیەتی خراپ و نە فێڵکردن و نەناپاکیی و نە خەفەت و نە دڵەڕاوکێ و نە تلانەوە بە عەشقەوە.. نە چوزانم .... بەختەوەریی بەرقەرار ئەبوو، ئا ئا هەموومان بەختەوەر ئەبووین.

(( ڕێژوان دێتە ژوورەوە، دوای سڵاو و وەڵام))

زوبێر: کوڕی باش ئەوە چیتە لە بێ کێشەییا یەخەی ژنەکەت ئەگری و کێشەی بۆ دروست ئەکەی؟

ڕێژوان(( سەردائەخا)): ببورە باوکە گیان، من ئەم ژنەم ناوێت.

زوبێر: ئەی بۆ هەر بە زۆری زۆردارەکیی پێت هێناین و نەتهێشت چلەی باوکی بچێت گواستنەوە؟ بۆ ڕێزی ڕۆژانی پێشووت ناگریت.

ڕێژوان: باوکە لە خەوێکی ناخۆش ئەچێت، ئەمەوێ زوو خەبەرم بێتەوە.

زوبێر: خۆ تا هێنات خەوی شیرینی بەرەبەیانت بوو.. خێرە وا زوو بوو بە خەوی ناخۆش؟ (( لەکاتی قسەکانیا زەنگی مۆبایلی بۆ دێت)) جارێ بوەستە قسەم نەکردووە.. (( بۆ مۆبایلەکە)) بەڵێ نارەوەن خان.

نارەوەن (( دەنگ )): کاکە زوبێر ئەگەر کارێکی زەرورت نییە؟!

زوبێر: نا کارم نییە، لەگەڵ منداڵەکان دانیشتووین.

نارەوەن: کاکە زوبێر دووبارە لێمان قەوماوە، تکایە ئەگەر ئەتوانی زوو بگە ئێرە.

زوبێر (( تێک ئەچێ)): خێر نارەوەن خان؟!

نارەوەن: کە هاتی هەموو شتێ ئەزانی، جارێ خواحافیز.

زوبێر: خوات لەگەڵ.. (( بۆ ڕێژوان و ئەوان)) تا ماڵی نارەوەن ئەچم، هەڵبەت کێشەیەکیان هەیە، ئەڵێ کە هاتی ئەیزانی، با بیانگەمێ بزانم چییە؟

چیمەن: خوایە خێربێ.

ڕێژوان: باوکە منیش دێم تاقەتی ئەم چڕوچاوەم نییە.

زوبێر: چڕوچاو ها؟ هەی چڕوچاو!

(( زوبێرو ڕێژوان ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٨٧٢ –ش/ د – باخی ماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو گێلاس دانیشتوون))

ئاکۆ: هەر نەمانزانی چییە؟

گێلاس: لەوە ناچێ مردوو بێ، چونکە قیژەقیژەکە زۆری نەخایاند، تەواو بوو.

ئاکۆ: ئەو ماڵە زۆر پێمانەوەن، بچۆ بە دەنگیانەوە گێلاس.

نینا (( دێتە دەرەوە)): وابزانم زاواکەیان شتی خراپی کردووەو پۆلیس گرتوویەتی، بەخوا باش تێنەگەیشتم.

گێلاس: کێ وتی؟

نینا (( سەردائەخاو سەیری مۆبایلەکەی ئەکا )): ئاوا.

ئاکۆ (( بە ڕووی خۆشەوە بۆ گێلاس)): ئەها چۆن بە تەنگیانەوە هات و هەواڵی پرسین؟ ئێستا تێگەیشتم بە ڕاستیەتی.

گێلاس: ئەی خەڵک چۆن بە گاڵتە شوو ئەکا؟ توخوا وانییە نینا؟

(( نینا بە بزەوە ڕا ئەکا بۆ ژوورەوە ))

ئاکۆ: ناچی؟

گێلاس: نەوەڵا ناچم، ئەوان بەس لە مردنا بە دەنگمانەوە دێن، هەزار شتمان بەسەر هاتووە، هەر گوێشیان نەداوەتێ، هەر دەمن.

ئاکۆ: کچێ لە کاتی دزییەکەیا چییان بۆ نەکردین، خۆ هەر بە دەورمانەوە بوون.

گێلاس: ئەوە جیاواز بوو، بۆ ئەوان ئەزانن زاواکەمان ناوی چییە؟

ئاکۆ: جا کوا زاوای ئێمەش ئەوان ئەناسی؟

گێلاس: ئەی من کوا زاوای ئەوان ئەناسم، لە کاتی دزییەکەیا هات بەلامانا؟

ئاكۆ: وا نابێ ژنەكە وانابێ.. لەبەرخاتری (( ئاوڕی ژوورەوە ئەداتەوە)) كچەكە، ئاخر سبەی دێن لە تۆی داوا ئەكەن!

گێلاس: با بچن لە مامە حەمەو مامە یاسینی داوا بكەن، خۆ هەر من شەرت نیم!

ئاكۆ: تۆ ئەمجارە بچۆ!!!

گێلاس (( هەڵئەسێت بۆ ژوورەوە بچێ)): ئەتوانی خۆت بچیت.

(( گێلاس ئەچێتە ژوورەوەو ئاكۆ سەر بائەدات ))

——— Cut ———

دیمەنی – ٨٧٣ – ش/ن –ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن زۆر تورە، تریفە لەخۆی ئەدات و بە هێمنیی ئەگری، تیرۆژ دەست بە سەری تریفەدا ئەهێنێ.. ئاواو ئامۆ بێدەنگن))

نارەوەن: سووک کچێ سووک، دراوسێکانم لێ تێمەگەیەنە، باجو مەگەر کەڕ بووبن گوێیان لەو هەموو قیژەو هەرایەت نەبووبێ.

تریفە: بەقوربانت بم هەڵشۆ گیان، خۆ تۆ بە من نەبێ زیانت  بە پەپوولەیەکیش نەگەیاندبوو.

نارەوەن: ئەگەر زیانی بە کەس نەگەیاندبێ، هەر ئەمشەوە ئەوپەڕەکەی، بەیانی لە ماڵەوەیە.

ئاوا: بەخوا سەروسەکوتی هەر لە خوێڕی و سەرسەریی ئەچوو!

تریفە: دەتوخوا تۆش بەسە ئاوا، گیراویشە هەر ڕقت لێیەتی؟ تۆ هەروا بوویت.

ئامۆ: باشە باش.. دایەن، تۆش بەسیەتی ئەو شیوەن و گریانە، ئێستا کاک زوبێر دێت و پێکەوە ئەچین بە سۆراخیەوە.. با وا نەتبینێ تریفە.

نارەوەن: دە هەستە بە قسەی کوڕەکان بکە، بچۆ دەموچاوێک بشۆ، با کاک زوبێر نەڵێ دیارە مەسەلەکە گەورەیەو پێم ناڵێن.

(( تریفە ئەچێ بۆ دەموچاو شتن))

تیرۆژ: هەر ئیشەکەی ڕەحمەتیی باوکمی نەکردبێ قەینا، بەر ئەبێ.

ئاوا: کچێ خوا ئەزانێ لەسەر چ سەرسەرێتییەک گیراوە، ڕەنگە دزیی کردبێ.. توخوا ئەوە پیاو بوو؟

(( نارەوەن بە دەست ئامازەی بێدەنگ بوونی لێ ئەکات و ئامازەی ئەو شوێنە ئەکا تریفە بۆی چوو، ئاواش هەر بە بێدەنگی دەست ڕائەتەکێنێ وەک ئامازەی " دە تێی هەڵدە"))  ____ Cut ____

دیمەنی – ٨٧٤ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بە هێز بە پێوە دێت و ئەچێت و دارێکی بە دەستەوەیە جاروبار بە سووکیی ئەیکێشێ بە ناولەپی دەستیا.. مفەوەزیک ئیفادە ئەنوسێتەوە، مولازم ئاری دانیشتووەو هەڵشۆ بە کەلەپچە کراویی لەسەر کورسییەکە))

بەهێز: لەسەر دانپیانانی ئاسۆو خەلیل، تۆ فەرمانت پێکردوون تەقە لە نارەوەن و حەمە خدربکەن؟

هەڵشۆ: بەڵێ، بە نیازی دوورخستنەوەیان لە یەکتر، چونکە زۆر تێکەڵ بوون، من گومانم نییە لەوەی خدر ئەیویست بە مارەکردنی نارەوەن دەست بەسەر سامانەکەیاندا بگرێ.. منیش چاوم لە سامانەکەیان بوو، پێم وتن تەقە لە خۆیان مەکەن، تەنها بیانترسێنن، بەوەش توانیم خدری لێ دوور بخەمەوە.

بەهێز: بەڵێ لە ئیفادەی نیزامدا ئەوە هەیە.

هەڵشۆ: بەڵام گەر خدر کوژرابێ من نەمکوشتووە، چونکە دیار نەماوە.

بەهێز: لە ئیفادەی خەلیلدا هاتووە، تۆ نەجاتت کردووەتە سەر گێلاس و جانتاکەی دەستیت دزیوە.. کە پارەیەکی زۆری تیابوو.

هەڵشۆ: ئەوە بۆ من نەبوو، تەنها بەشێکی کەمی نەبێت.. لەسەر فەرمانی زەکی بوو.

بەهێز: ئاسۆ کە زۆر هاوڕێی نەجاتی کوژراو بووە، پێی وتین ئەو زەکییەی تۆ ناوی ئەبەیت، ئەوە میری گەورەتانە..

هەڵشۆ: نەخێر، ئەو پیاوی لای میری گەورە بوو.

بەهێز: ناوی ڕاستیی میر چییە؟

هەڵشۆ: من تەنها میری گەورە ئەزانم، هیچیتر.

بەهێز: لەبەرچی فەرمانت کردووە بە کوشتنی شۆڕش و دواتریش کوڕەکەی کە ناوی ڕۆڤان بوو؟ چ پەیوەندییەکت بەوماڵەوە هەبوو؟

هەڵشۆ: من بە هیچ جۆرێک شۆڕش و کوڕەکەی و خێزانەکەیم نەئەناسی، بەڵام دوای کوشتنی شۆڕش زانیم کە خوشکێکی دراوسێی ماڵی خەزورمە.. فەرمانی زەکی بوو، ئەویش لە میری گەورەی وەرگرتبوو.

بەهێز: چەندت وەرگرت بۆ کوشتنی ئەو کوڕو باوکە؟

هەڵشۆ: گەورەم فەرمانی میر بە پارە جێبەجێ نەئەکرا.. گەر جێبەجێ نەکرایە ئەیکوشتین.. هیچم وەرنەگرت.

بەهێز: تۆ نیزام و شامورادت ناردۆتە سەر ماڵەکەی خۆت و پارەی ژنەکەتیان دزیوە.. کەس هەیە دزیی لە ژنی خۆی بکا؟ ئەوەت بۆ کرد؟

هەڵشۆ: گەورەم کاتی خۆی خەزوورم ئەو قاوەخانەیەی بۆ من کڕی و بە ناوی تریفەی هاوسەرمەوە تۆماری کرد وەک عورف و عادەت کە کچی خۆی بوو.. منیش پارەکەم گێڕایەوە بۆ خۆم و پارێزراویشە.. لە ناو ئەو پارانەدایە کە لای خۆتانە.

بەهێز: هههه بە ئەمانات بۆی هەڵگرتووە.. تۆ لە ڕێگەی شامورادەوە ئدریس و شاخەوان، ئەوی دوایی لەسەر فەرمانی تۆ نەجات کوشتی، لەگەڵ زایەردا، کە ئەویشت هەر بە نەجات کوشت.. ناردبووتنە سەر ماڵی خەسووت کە لە دەرەوەی وڵات بوو؟

هەڵشۆ: بەڵێ گەورەم وامزانی پارەو ئاڵتونی لە ماڵەوە داناوە، هیچیشی لێ نەبوو، وەک عەرزم کردی، چاوم بڕیبووە سامانەکەیان.

بەهێز: ماڵی سەرتیپی حاجی مەشکەفرۆش؟

هەڵشۆ: بەڵێ گەورەم، زانیم لە ماڵەوە نین.. وا بزانم پارەو ئاڵتونەکەی خۆتان لەوێ دەستیان بەسەرا گرت.

بەهێز: هاندانی نارەوەن بۆ بازرگانیی تلیاک؟

هەڵشۆ: گەورەم وەک نەمتوانی هیچیان لێ هەڵکرێنم، ویستم بە جەستەی مێردەکەی بەرم، بەڵام ترسام و ئەو ئیشەم ڕاگرت.

بەهێز: میری گەورەم بۆ باس کە.

هەڵشۆ: گەورەم بە ئێستاشەوە نازانم کێیە.. هەر ڕۆژەی بە ژمارەیەک تەلەفونی بۆ ئەکردم و دواتر مۆبایل و سیمکارتەکەشی ئەشکاند.. منیشی فێری ئەوە کردبوو، تا کەس نەتوانێ چاودێریی بخاتە سەر تەلەفونم.

بەهێز: ئەو باخەی تیایدا ئەژیای بە ناوی کێوەیە؟

هەڵشۆ: گەورەم بە ناوی خۆمەوەیە، میری گەورە بۆی هەڵبژاردبووم، بۆ ئەوەی دوور بێت لە تاوەری هێڵی تەلەفونەوە، لە ناو کۆمەڵێک ماڵی زۆردا بۆ سەرلێشێواندنی حکومەت.

بەهێز: جا حکومەت کاری بە تاوەر چییە؟ هەر ڕێگە زۆرە بۆ دۆزینەوەی خۆت و میرەکەشت، دڵنیابە گۆڕەکەی ئەویش زۆر دوور نابێ لەوەی تۆوە.. پێم بڵێ چۆن پەیوەندیی تۆو میر دروست بوو؟

هەڵشۆ: گەورەم لە ڕێگەی خەزورمەوە.

بەهێز: یەعنی دارەوان ئەیناسی؟

هەڵشۆ: بەڵێ گەورەم، بەڵام پێی نەوتم کێیە.

بەهێز: چۆن بە یەکتری ناساندن لە ڕێگەی تەلەفونەوە؟

هەڵشۆ: گەورەم من یەکێک بووم لە پاسەوانەکانی خەزوورم، کە لە دانپیانانیدا ناوی نەهێنام.. ڕۆژێکیان دوای ئەوەی ڕێشارم بەڕێکرد و هاتمەوە لای و دەمامکەکەم لابرد، داینیشاندم...........

<u>**بۆ فلاشباک**</u>:

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______________

**فلاشباک**: دیمەنی – ٨٧٥ – ش/ن – ژووری پاشا کاتی دارەوان:

(( هەڵشۆ بە دەمامکەوە دێتە ژوورەوەو دەمامکەکەی لائەباو بە پێوەیە))

دارەوان: دانیشە کوڕم.

هەڵشۆ: ئەمرکە مامە گیان (( دائەنیشێت))

دارەوان: لەم ئارامییەی ئێستادا ئەمەوێ چاوێکیشمان لە داهاتوو بێ.

هەڵشۆ: مەبەستت چییە مامە گیان؟ تێ ناگەم.

دارەوان: ئەمە دنیایە ئەگەر من گیرام، یان مردم بە هەر ڕووداوێک.. خۆت ئەزانی کە بگیرێم ئەوەمان کردووە کە یەکسەر ببرێم بۆ پەتی سێدارە.

هەڵشۆ: خوا قەت بەو ڕۆژە نەکا مامە گیان، خوا نەخواست ئەوە ڕوویدا، خۆ بۆ منیشە هەر تۆ ناگرێتەوە.

دارەوان: نا بۆ تۆ نابێ، ئەمەوێ لە ئێستاوە لێرە دوورکەویتەوەو هەر کاتێکیش بگیرێم، ئەمە دنیایە، کەس ناوی تۆ نابا، چونکە هەر خۆم ئەزانم تۆ لێرەیت.

هەڵشۆ: مامە گیان تۆ باوکمی، ئەزانی تۆ بڕۆی من چیم لێ بەسەردێت؟

دارەوان: هیچت بەسەر نایەت کوڕم.. من ڕێگەیەکت بۆ دائەنێم، ئەگەر مردیشم ئەوەندەت هەبێ، چاوت لە تریفەو ئەوانیتریشەوە بێت، من متمانەم بەوان نییە بۆ ئەم ئیشەی پێت ئەڵێم، بەڵام تۆ ئەوەندە سەردەرکردووی، ئەتوانی هەموویان بژێنیت لە ئێستاشیان باشتر.

هەڵشۆ: فەرموو مامە گیان، بەو هیوایەی بەس تۆ لێم ڕازیی بیت، من سەرم دائەنێم لە پێناوی تۆو ماڵ و منداڵتا. ئیتر خۆ کوڕی خۆتانم.

دارەوان: ئێستا کەسێک هەیە بۆ دوای خۆم، ناوی میری گەورەیە.. تۆش دوای من ئەبیت بە پاشاو وەک من فەرمان دەرئەکەی.

هەڵشۆ: قەت خوا بەو ڕۆژە نەکا، بەڵام چۆن؟

دارەوان: کەسێک دوای من بە ناوی میری گەورەوە تێلت بۆ ئەکا.. ئەو کاتە پارەیەکت بۆ ئەنێرێ بۆ کڕینی شوێن و سەیارەو خەڵک کڕین، خۆی سەرەتا دوو پیاوکوژی باشت بۆ ئەنێرێ بتپارێزن.. دواتر تۆ بە هەمان دەستوری ئێستامان ئەبیتەوە بە پاشا.. ئەگەر بەهۆی شوێنەکەوە گومانت هاتە سەر، ئەوا ئەبێ بە ڕاوێژ لەگەڵ میری گەورە، شوێنێکیتر دابنێین دوور بێ لە هەموو جۆرە مەترسییەک، بەڵام گەر بەهۆی شتیترەوە بوو، ئەوا هەمان دەستور دووبارە بکەنەوە.

هەڵشۆ: مامە گیان شوێنی تۆ بە کەس پڕ ناکرێتەوە، ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟

دارەوان: کە پارەو چەکت پێ بوو، بە ئاسانیی دەسەڵاتیشت بۆ دروست ئەبێ.. پشت بەم دەمامکەو شێوەی بەکارهێنانی ببەستە هەڵشۆ، قەت تێ ناکەوی.. کەسایەتی دەرەوەت قەت تێکەڵ ناکەی بە پاشاییەکەی ئێرەت.. باشە ئەوەت بە قسە کردووم، کەس لە دەرەوە نازانێ تۆ پیاوکوژی، هەر بە سادەو ترسنۆکت ئەبینن، ئەوەم بە دڵە، ئەوکاتەش هەروابە.. هەزار شەقت تێهەڵدرێ، هانا بۆ دەسەڵاتی ئێرەت نەبەیت.. لەسەر ئەم کورسییە تۆ پاشای بۆ ئەو ئیشانەی کە لێرەیە، لە دەرەوەش تۆ هەڵشۆیت و ئێرە نایەت بە بای گوێشتا.. ڕقت لە هەرکەسێک بوو لەدەوەرە، ئەگەر زوخاوە جەرگیشت بکا، بە دەسەڵاتی ئێرەی نابەستیتەوە، لێرەوە دەرەوە فڕێ ئەدەیت.

هەڵشۆ: سوپاس مامە گیان بۆ ڕازیی بوونت لە هەڵسوکەوتم.

دارەوان: پارەی ئێرەت بۆ دەرەوە بەکارناهێنیت هەتا لێرە بی، تا ئەوکاتەی ئەزانی بەستە، دەست لێرە هەڵئەگری و پیاوەکانت ئیزن ئەدەیت و ئەکەویتە کەسابەت.

هەڵشۆ: ئەمرەکەی مامە گیان.

دارەوان: نهێنی ئێرە لای هیچ کەسێک نادرکێنیت بە تریفەی ژنیشتەوە، جگە لەو کەسانەی کە ئەتەوێ بیانکڕیت.

هەڵشۆ: فەرمانتە.

دارەوان: ئەگەر کەسێک بوو بە تەگەرە بۆ ژیانی کاروباری ئێرەت و هیچ چارەسەرێکیشی نەبوو، پێت وایە ڕێگری ژیانت ئەبێ.. بە فەرمانێکت لە ناوی ئەبەیت.

هەڵشۆ: بەڵێ بەسەرچاو مامە گیان.. دیارە جەنابیشت ئەوەت کردووە.

دارەوان: زۆریش.. هەندێکیانت بۆ باس ئەکەم.. ئێستاش کە ڕۆشتیتەوە، تا پێت نەڵێم بۆ هاتنت.. هەر بیریش لەم شوێنە ناکەیتەوە.. بازرگانی تلیاکەکەم هێناوەتە قاوەخانەکەتەوە لە ڕێگەی ئەو کارتۆنە ئاوانەوە کە بە ڕێشاری ئەکرم، لە ناویانا تلیاکەکە ئەخرێتە کارتۆنی تایبەتەوەو دوو کەست لە قاوەخانەکە بۆ دائەنێم خۆیان سەرپەرشتی هێنان و فرۆشتنەوەی بکەن و بۆ گواستنەوەشی پارەیەکی مۆڵت بۆ دابنێن.. ئیتر پێویستیت بە هیچ نابێ.

هەڵشۆ: نەوەڵا مامە گیان.. ئەی ئەوساش لەگەڵ تۆیا ناگیرێم ئەگەر خوانەخواست ڕوویدا؟

دارەوان: نا تەنها ئەو دوو کرێکارە ئاگاداری ئەو گواستنەوەیەن، من ناوی تۆیان لا ناهێنم، لە ڕێگەیەکیترەوە پارەکەت پێ ئەگا.. لە دوو شوێنی تایبەت پارە دائەنێی، نەک تۆش لە پاشایەتییەکەتدا بگیرێی یان بمری، وەک من بکە، منیش لە دوو جێ دامناوە، لێرەو لە شوێنێکیتر.. با قاوەخانەکەش بە ناوی تریفەوەو بی، چوویتەوە خانووەکەشت بخە سەر ئەو، با کە شتێکت بەسەرهات ئەویش بتوانێ بژی.

هەڵشۆ: بەسەرچاو مامە گیان.

دارەوان: خزمیش بکە بە پاسەوانی خۆت، لە بێگانەکە باشترە، تا نزیکتر بێ باشتر پارێزگاریت ئەکا.

Cut

**فلاشباک تەواو:**

دیمەنی – ٨٧٦ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٨٧٤ – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری بە وریایی گوێ لە هەڵشۆ ئەگرن، مفەوەز ئەنوسێتەوە ))

هەڵشۆ: وتی هەڵشۆ بە ڕێشاریشم وتووە، بە نەمانی منیش ئەم ئیشە بەردەوام ئەبێ، یان خۆت یان باوەڕپێکراوێکت بنێرە بۆ خزمەتی پاشای تازە.. ناونیشانێکم داوەتێ، بتدۆزێتەوە، بەڵام تۆ نا، لە ڕێگەی میری گەورەوە ئەگاتە لات.. تۆش متمانەت پێی هەبێ و بیکە بە پیاوی خۆت.

بەهێز: ئەو ناونیشانە کوێ بوو؟

هەڵشۆ: گەورەم پێی نەوتم.

بەهێز: ئیمزا لەسەر وتەکانت بکەو لای دادوەریش دووبارە ئەبێتەوە.

هەڵشۆ: بەڵێ.

بەهێز: ڕێشار گیرا، کەواتە ئەو ناونیشانەی داوە بە براکەی، ئۆوا **!** (( زەنگی دەرەوە لێ ئەدا.. پۆلیس دێت و تحیە )) بیبەرەوە بۆ جێگەی خۆی و شاموراد بێنە.

(( پۆلیس هەڵشۆ ئەباتە دەرەوە ))

بەهێز: نزیک بووینەوە لە بنبڕکردنی ئەم گروپە.

ئاری: ڕێگەی دۆزینەوەی میریش ئاسان بوو.

Cut

دیمەنی – ٨٧٧ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی گێلاس:

(( تیرۆژ لە ئۆفیس دێتە دەرەوە، تێل ئەکا..))

تیرۆژ: ئەلو کاک سەرچڵ، بەڵێ لەسەر قسەکەی خۆت وا ئێستا بەرێکەوتم بۆ لات ............ بەڵێ ناونیشانەکە ئاسانە ........... باشە بای!

(( دەست لە تاکسیەک ڕائەگرێت سەرئەکەوێت و ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٨٧٨ – ئۆفیسی گێلاس:

(( نیگارو ڕەمزی و شەنیا ))

ڕەمزی: ئەوە پەیوەندیی بە خۆیەوە هەیە، چ باکمە باش بێ یان خراپ؟ گرنگ ئەوەیە وانەکا توشی زەرەرمان بکا.

نیگار: تازە هاتووە دەسەڵات چییە؟ ئیتر ئیشیش وایە خۆ یەکەمجار نییە هەڵە بکەین، هەڵەی ئەمجارەمان لە چاو جارانیترا هەر زۆر بچوکە. ئەمجارە لە خێرەکەی خۆی ئەخوا نەک زەرەر بێ.

ڕەمزی: نیگار خان ئەگەر چاوی لێ بپۆشین جاریتر زەرەر ئەکا.. ئەبێ لەسەر یەک دینار لێپرسینەوە بکرێ، تا هیچ بە هەدەر نەدەین.

نیگار: ڕاستە، بۆ جاری داهاتوو.

ڕەمزی: ئەی لێپرسینەوە؟

شەنیا: لێپرسینەوە ئەبێ لە تۆوە دەست پێ بکا، کە گێچی سەندەویچ پەناڵەکەت بە ڕەزامەندیی زارەکیی کەمکردەوە.

ڕەمزی (( تێک ئەچێ )): ئەی خۆ پلاستیکەکەی ژووری ئەو دووانە لەسەر نەخشەکە صاجیی دانرابوو؟

شەنیا: هەهە وابزانم چینکۆکە نەبوو؟ هەهەهە.

نیگار: تکایە بەسە.. ئەمجارە تازە تێپەڕی، ناکرێ هەر یەکترمان بینی ئەم باسە بکەینەوەو یەکتر تۆمەتبار بکەین.. تەواو.. ڕازیم نییە جارێکیتر وا لەگەڵ یەک قسە بکەن.. ئەرێ مێشکم چوو.. دە بەسە.

(( ڕەمزی ئەچێتە دەرەوە ))

شەنیا: زۆر ببورە نیگار خان، ئێمە لە باسی چیبیا بووین و ئەو هات کردی بە چی؟

نیگار: هەر بەڕاستی ناخۆشی کردووە، بەڕاست من لەگەڵ ئەوم بوو لێی تێکداین.

شەنیا: دەی دەی دڵت وەک پشکۆ گەشاوەتەوە، ئاگام لێیەتی هەهە.

نیگار: نا نا شەنیا بە هەڵە تێمەگە، من تا دەوران تەواو داو و دامەزراو نەکەم، چۆن بیر لە شتی وا ئەکەمەوە.

شەنیا(( لە کاتی قسەکانی نیگاردا سەیری دەرەوە ئەکا)): ئا ئا، خۆ ئەڵێی ئەویش ئاگری دڵ هەڵیگرتووە، وا هات.

نیگار(( دەست ئەگرێ بەدەمیەوە)): یا حافیز!! (( بەدەنگی بەرز پێکەنینی هەردووکیان، زوبێر دێتە ژوورەوەو دوای سڵاو))

زوبێر: هەر بە پێوە ویستم سەرێکتان لێ بدەم و ئەحواڵتان بپرسم.

شەنیا: بەخوا من کەس ئەحواڵم ناپرسێ کاک زوبێر.

نیگار: یاخوا بەخێر بێی، ئەوە هەروا دەم بەگلەییە گوێی مەدەرێ.

زوبێر: ئەی ئەوە نییە من بە ڕیشی بۆزەوە هاتووم بۆ ئەحواڵ پرسینی تۆش.

شەنیا: دەی گوڵە جۆکەیە بە هۆی گەنمەکەوە. ها؟ (( بزە))

نیگار: ئەوە ئەڵێی چی؟ جا من گوڵە جۆکەم یان تۆ بەو هەموو عیشوەو نازەتەوە، ئاگات لێیە کاک زوبێر؟

زوبێر: دەی مادام ئەوەندە لە بەشی خۆی ناڕازییە، ئەم ئێوارەیە پێکەوە نانێک ئەخۆین لەسەر شەرەفی شەنیا خان.

نیگار: نەبەخوا پێویست ناکا زۆر سوپاس.

شەنیا: مادام لەسەر شەرەفی من ڕێکی ئەخەی، زۆر قبوڵە، دەورانیش ئەهێنین.

زوبێر(( بۆ نیگار)): ئا ئا کچەکەش بێنی با بیبینم.. بە یارمەتیتان زۆرم پەلەیە، من کارێکم لەبەرە (( خواحافیزیی و ڕۆشتنی زوبێر))

شەنیا: ئەها خۆم گیان.. چۆن بە یەک قسە بەشی ساڵێک لەیەکم نزیک کردنەوە؟

نیگار: نا شەنیا گیان ئەوە جوان نەبوو، کابرا بە ڕوونیی هەستی پێکرد.

شەنیا: ئەرێ من دڵی هەردووکتان ئەخوێنمەوە، بە مۆدێلە کۆنەکەی خۆشتان، هەردووکتان بە ترسنۆکیی ئەچنە پێشەوە، بیتەقێنەو تەواااااو.

نیگار: من لە مۆدێلە کۆنەکە نیم بەقوربان، ڕاستە تەمەنم هەیە، بێتە سەر حاڵەتێک و بزانم هەر قسە ناکا، خۆم پێم ئەوت.

شەنیا: هەی لە نیگار خان، ئەی بۆ وا بە من ئەڵێیی؟ ئەبووایە خەڵاتم بکەی کە ئەم دەعوەتەم دروست کرد.

نیگار(( بە نازەوە)): نا جارێ زۆر زوو بوو.

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٨٧٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن و ئامۆو ئاواو حەمەخدر گرژن))

نارەوەن: نەوەڵا باوەڕو متمانەم بە عەبادەل بەشەر نەماوە، تۆ وەرە وەرە هەڵشۆی خوێڕی پاشا دەرچێ.. ئەی ئەبێ ئامۆو ئاواو خدرم چی دەرچن (( بە سەری خۆیا ئەکێشێ)) هاوارەکە بە مالّم.

ئاوا(( فشقیات)): جا کێ ئەڵێ تۆش شاژنێک دەرناچی؟ هاهاها.

خدر: لێشی دێت ئاگات لێیە؟

ئامۆ: خۆی ئێستا شاژنی ئێمەیە، بکوژو ببڕ هەر خۆیەتی.

نارەوەن(( گرژتر)): دە توخوا بەسە من وا مێشکم ئەتەقێ و ئێوەش لە بەزمی خۆتان ناکەون.

ئاوا: بۆ مێشکت ئەتەقێ؟ هەڵشۆی خوێڕییەو ملی ئەکرێ بە پەتاو بۆ تا هەتایە تریفە ڕزگاری بوو.. خۆزگە بە بەرچاوی خەڵکەوە هەڵیانئەواسی، ئەگەر یەکەم چەپڵەم بۆ لێنەدان و فیکەم لێ نەکێشا، بە ناوی خۆمەوە بانگتان نەکردمایە.

نارەوەن: جا چی لە تۆیە؟ خۆ تۆ قوڕ بەسەر نابیت، تۆ سبەی پەلی نینا گیان ئەگریت و ئەچیتە ماڵ و حاڵی خۆتەوە.

ئاوا: ئەها! خەمی تریفە گیانیەتی(( سەری دایکی ماچ ئەکا)) خەمت نەبێ دایە گیان، بەخوا ساڵ نابا ئەچێتە ماڵێکیترەوە، من خوشکی خۆمە باشی ئەناسم.. هههە

نارەوەن: دە دەمت داخە بێتەربێت.

(( پێکەنینی ئەوان جگە لە نارەوەن))

خدر: لە ئیفادەیا وتوویەتی ڕەحمەتیی کردوویەتی بە پاشا دوای خۆی.

ئامۆ: ئەوە بۆ خۆ پەڕاندنەوەیە، سەری دای لە بەرد.

خدر: خۆ پەڕاندنەوەی چی؟ زۆر خراپ تیاچووە، هیچ شتێک دادی نایا.

ئاوا: لەوەولاتر چێ، بەخوا لەوڕۆژەوەی تریفە شووی پێکردووە، خۆشیم بە چارەیا نایەت.

نارەوەن: وابزانم کار لە پارێزەرا نەماوە!

ئاوا(( پێکەنین بە بەرزی)): جا بۆ دوو سێ محامیشی بۆ ناگری نارەوەن خان؟

نارەوەن: بەسە با لە داخی تۆ سەری خۆم نەکێشم بەو دیوارەیا.

ئامۆ: بەسە ئاوا کاتی فشقیات نییە مستەر فشقی.

ئاوا: ئەی ئەوە نییە خۆت فشقیات ئەکەی؟ وەڵاهی من وائەزانم مێشولەیەک ئەکوژن، لەبەرئەوە تاقەتی خۆتێکدان و گرژیی نارەخانم نییە، ئەچمەوە بۆ کۆمپانیا.

ئامۆ(( هەڵئەسێ)): منیش ئەچمەوە بۆلای کاک زوبێر، تا کۆمپانیای دەرگاو پەنجەرەکە چوو، ئێستا هاتۆتەوە.

(( ڕۆشتنی ئاواو ئامۆ))

نارەوەن: ئەی ناوی کەسی نەداوە؟

خدر: مەبەستت کێیە؟

نارەوەن: زۆر ئەترسم، لە کوڕەکان!

خدر: نا نارە خان ناوی کەسی نەداوە، بەڵام من لە ناخەوە لە ئاوا ئەترسم.

نارەوەن: منیش ترسەکەم لەوە، ئەترسم باوکی چووبێتە بن کلێشەی و ئەو میری گەورەیە ئەم بێت.. وای دەر ئەخا زۆر ڕقی لە هەڵشۆ بێت، ئەترسم هەر بەزمەکەی دارەوان و ڕێشار بێت.

خدر: چیتر؟

نارەوەن: نازانم شت زۆرە بۆم کۆناکرێتەوە.

خدر: بەو هیوایەی ئەو نەبێت.. بە ڕاستی کارەسات ئەقەومێ.

نارەوەن: بە گەورەیی خوا ئەوبێت، ڕێک فیشەکێک ئەنێم بەسەری خۆمەوە.. قەت بەرگەی ئەوە ناگرم.

خدر: نا نا جارێ بیری خۆت مەشێوێنە، بەو هیوایەی ئەو نەبێت و ئێمە بە هەڵەدا چووبین.

نارەوەن: من زەینم قەت درۆی لەگەڵ نەکردووم، یاخوا ئەمجارە درۆی کردبێ.

(( بێدەنگیی))

Cut

دیمەنی – ٨٨٠ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز تەنها دانیشتووە))

**بەهێز مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

ئەبێ زۆر نزیکتر بێ لە دارەوانەوە، حساباتی زۆر وردی بۆ کردووە.. شامورادیش نەیبینیوە، لە ڕێگەی نامە گۆڕێنەوەی دانراوەوە ناردوێتیە لای هەڵشۆ.. ناکرێ کەسی دووری بێت، چونکە هەموو دەسەڵاتی داوە بەو و بەو وردەکاریشەوە پاراستوویەتی.. گەر میری گەورە نەگیرێ، سبەی دوو سبەی پەنجا پاشایتر هەڵئەتۆقن و ئەم وڵاتە ئارام نابێت..

مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:

بەهێز(( لەبەرخۆیەوە)): میری گەورە میری گەورە! ئەبێ کێ بیت؟ ئامۆ؟؟؟؟ ئاوا؟؟؟؟؟

با داوا لە دادوەر بکەم بانگ بکرێن، شتێک ڕوون ئەبێتەوە.

ملازم ئاری (( دێتە ژوورەوەو تحیە)): گەورەم!

بەهێز: سەرلەنوێ هەموویان بانگ ئەکەمەوە مولازم ئاری.. من هەست ئەکەم لەمناوەیا بازنەیەکی ون هەیە.. نیازم وایە ئامۆو ئاوای کوڕی دارەوانیش بانگکەم.

ئاری: ئەوان بۆ گەورەم؟

بەهێز: دارەوان زاواکەی کردبێ بەوەو بەو جۆرەی تا دۆزیمانەوە خوێنمان بوو بە ئاو.. ئەی ئەبێ میر کێ بێ؟ کە زۆر زیاتر لە هەڵشۆ کارڕایی پاراستنی بۆ دانابێ.. ڕاستە ڕەنگە بە هەڵشۆشی نەوتبێ میر کێیە، ئەویش بۆ پاراستنی زیاتری میر.. کەواتە بە هەر ئاراستەیەکا بیر بکەیتەوە، کوڕەکانی چەقی بازنەکەن.. ڕێگەیەکیش هەیە بۆ نزیک بوونەوە لە میر.

ئاری: گەورەم من هیچی تیا نابینم، پێویست بە دووبارە کردنەوەی لێکۆڵینەوە بکات.. بۆ کەسێتیی میریش، نازانم، هەست ئەکەم نیزام، یان سەردار بێت، یان ئەویش هەر هەڵشۆ خۆی بێت و هەر سێ ڕۆڵەکەی گێڕابێت.. دوور نییە ڕاستیی پێ نەوتبین.

بەهێز: واتە وەک کەسایەتی ئاسایی خۆی و کەسایەتی پاشاو کەسایەتی میر؟

ئاری: دەمخۆش، بەڵام مەترسی ڕاستەقینەش لە ون بوونی میردایە، کەواتە بیرکردنەوەکەت زۆر لەجێی خۆیدایە، کە بازنەیەک ونەو ڕاستە لەو ناوەندەشدایە.

بەهێز: ئەی بۆ کوڕەکانی دارەوان؟

ئاری: من بیرم لێ نەکردبوونەوە، بەڵام ڕاستە دوور نییە سەرەداوێکیش لەوانەوە دەستکەوێت.

بەهێز: ئێستا دووبارە لێکۆڵینەوە دەست پێ ئەکەمەوەو لە بارەی چۆنێتیی تەلەفون و دەنگەکەی میرەوە پرسیار ئەکەم.. ڕەنگە درۆو ڕاست لەیەک جیا بکەینەوەو بابەتی نوێش بوروژێ.

Cut

دیمەنی – ٨٨١ – ڕ/د – بەردەمی ئۆفیسی سەرچڵ:

(( سەرچڵ لەبەردەرگا چاوەڕوانە، ئۆفیسەکە هیچی تیا نییە، تیرۆژ بە تاکسیەکە دێت و دائەبەزێت، سەرچڵ بەرەو پیری ئەچێت، دوای سڵاوی کورت))

تیرۆژ(( بە سوکایەتیی ئاماژەی دوکانەکە ئەکا)): ئەمەبوو ئۆفیس ئۆفیست گرتبۆوە؟ ئەی بۆ نەتوت دوکانێکی چۆڵ؟

سەرچڵ: ببورە من چاوەڕوانی یەکێک بووم بێت و دەست بەکار بین، ڕاستیەکەی بە خۆم بەڕێوە ناچێت، فەرموو با بچینە ژوورەوە.

تیرۆژ: ببورە من نایەمە دوکانی چۆڵەوە.. ئەتوانین لە جێیەکی تر دانیشین.

سەرچڵ: بەسەرچاو، با دایخەم.

تیرۆژ: دایمەخە کەس هیچت لێ نادزێ، مێزێکی شەق و شڕەو هیچیتر.. تۆ بۆ شتێک بە قسەی من ناکەی؟

سەرچڵ: ئەمرکە چی بکەم؟

تیرۆژ: دوکانەکە داخەیت و یەکێ خێری لێ ببینێ باشترە.

سەرچڵ(( بەدەم دوکان داخستنەوە)): ئێستا تێت ئەگەیەنم ئەو ئیشەی ئێمە چەند باش ئەبێ، ئێستا بچینە قاوەخانەیەک باشە؟

تیرۆژ: یەعنی!!

سەرچڵ: تۆ بە تاکسی هاتی، بە سەیارەی من بڕۆین؟

تیرۆژ: نا ببورە، نزیکترین قاوەخانە.

سەرچڵ: سەرچاو.

(( ئەچن بۆ قاوەخانە))

Cut

دیمەنی – ٨٨٢ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس دانیشتووەو ئاوا دێتە ژوورەوە.. دوای سڵاو دائەنیشێ))

ئاوا: ئەی تیرۆژ کوا؟

گێلاس: تا ئۆفیسێک چوو، کابرایەک هات داوای کارمەندی کچی ئەکرد، ئیتر تیرۆژ وتی هاوڕێیەکم بێ ئیشە، ئەچم تەماشایەکی ئیشەکەی بۆ ئەکەم، ئەگەر بەدڵم بوو، ئەیننێرم.

ئاوا: ئەوە ئاساییە، بەڵام گێلاس خان تکایە زۆر ئیزنی مەدە بەملاولایا.

گێلاس: ئەوە حەیفت نەکرد ئاوا گیان؟ جا فەرقی سۆماو تیرۆژ چییە؟ خەمت نەبێ خوشکەکەت زۆر عالییە.

ئاوا: سوپاس.. ئەمرکە.

گێلاس: ئێستا ئێمە باش بووین ئاوا گیان.. ئەم ماوەیەش نەتهێست هیچت بۆ بگێڕینەوە، تاسەر وا ناکرێ و قبوڵیشی ناکەم.

ئاوا: ئەی هەر بە تەلەفون بتوتایە، خۆ من هیچت لێوەرناگرمەوە.

گێلاس: هەرچی مانگەکانی پێشووشت هەیە، هەموویت بۆ ئەگێڕمەوە، قبوڵیشی نەکەی بەو گۆڕەی مردووی هەردوولامانی تێچووە، هەر ئەمڕۆ ئوتێلەکە دائەخەم، ئەوە پارەکەت لە قاصەکەیا، (( سوعبەت)) ئەگەر بەرتیلی نیناشە، من بەرتیل قبوڵ ناکەم. هههە.

ئاوا: مادام بە بەرتیلت زانی، دوا بە دیناریت لێوەرئەگرمەوە هههە.

گێلاس: ئەرێ ئەو باسەی زاواکەتان ڕاستە؟

ئاوا: دوور لە ڕووی تۆ ئەوە هەر خوێڕی و سەرسەریی بوو، شایانی زۆر لەوە زیاترە هەڵواسرێ، ئەبووایە ڕۆژانە لوقمە لوقمە گۆشتی لێ بکەنەوە.. کەی بەشەرە تا باسی بکەین.

گێلاس: توخوا ئاوا گیان خۆت لە قەرەی پارەی حەرام مەدە، ئەوەتا یەک یەک بە بەرچاومانەوە هەڵئەواسرێن.

ئاوا: ئەوە ئاوا تێمگەیشتووی گێلاس خان؟ من وا تازە بە نیازی ژنهێنانم، هەر گاڵتەشم بە ئەقڵی ئەو جۆرە کەسانە نایەت، من ئیشی خۆم ئەکەم و پەیوەندیم بە کەسەوە نییە، تکایە ئەوانە مەخەرە ئاستی منەوە.

گێلاس: نا دوور لە تۆ، مەبەستم خراپ نییە، ئەڵێم تا دوورکەویتەوە باشترە.. توخوا ئەوە نەهامەتیی نییە بەسەر ئەو تریفە داماوەیا ئەیهێنێ.

ئاوا: خەمی نینات نەبێ، تا مردن وەکو پاشا ئەژی.

گێلاس(( سوعبەت)): نا توخوا پاشا نا، هەر شتێکیتر ئەڵێی بیلێ، تەنها پاشا نا.

(( پێکەنینی هەردووکیان))

گێلاس: پۆلیسیش ئاگاداریان کردمەوە سەریان لێ بدەم.

ئاوا: خێر؟

گێلاس: هیچیان نەووت، ئیتر نازانم بۆچییە؟ تۆ بڵێی پۆلیس ئەوەندە بە ئاگا بێ پارەی من بدۆزێتەوە؟ هەر بیریشم چۆتەوە پارەیەکم دزراوە.

ئاوا(( هەڵئەسێ)): دەی با دوات نەخەم.. نەتگەیەنم؟

گێلاس: نا بەساقەوبم سەیارەم پێیە.

((لەبەر هەستانی گێلاس و ڕۆشتنی ئاواو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ٨٨٣ –ڕ/ د - قاوەخانەیەک:

(( سەرچڵ و تیرۆژ دانیشتوون))

سەرچڵ: ئینجا کە یەکێک شتێکی ئەوێ، لە هەر ولاتێک بێ، داوا لە ئێمە ئەکا بۆی بێنین، چەند کۆمپانیایەکی جیهانیش هەیە ئەوە ئیشەکەیانە، ئێمە پێیان ئەڵێین و شتەکە ئەگاتە ئێمە.. بەوەش قازانجێکی باشی بۆ ئێمە تیایە، دڵنیابە ئەو ئیشە ئەوەندە زۆر ئەبێ، نەتپەرژێتە سەر سەر خوراندن.

تیرۆژ: ئەو قسانە هەڵگرەوە بۆ خۆت، تۆ ڕاست ناکەیت، بە دوای کارمەندا ناگەڕێی، تۆ ئیشێکت بە من هەیە.

سەرچڵ: نا تیرۆژ خان بە هەڵە لێم تێمەگە.

تیرۆژ(( لە جانتاکەیا سیدیەک لە ناو کەڤەرەکەیدایە، دەری ئەهێنێت و بە دەستی خۆیەوە نیشانی سەرچڵی ئەدات)): ئەم سیدیە ئەبینیت؟

سەرچڵ: بەڵێ، ئەوە چییە؟

تیرۆژ: ئەوە بەڵگەی تاوانبار کردنتە لای پۆلیس.. (( سەرچڵ تێک ئەچێ)) تۆ وتت هەموو شوێنێک گەڕاوم بۆ کارمەندێکی کچ و هاتوومە ئێرەش.

سەرچڵ: بەڵێ، من دوکان بە دوکانی ئەو ناوە گەڕاوم و کارتم داونەتێ، تەنانەت کە کەس نەهات، بیرم لەوە کردەوە، مالانیش بگەڕێم.

تیرۆژ: ڕاست ناکەیت.

سەرچڵ: تکایە!

تیرۆژ: ئێمە بۆ ئوتێلەکەو پاش ئەوەی دزییە گەورەکەمان لێکرا، نەک هەر چواردەوری ئوتێلەکەمان، بەڵکو سەرشەقام و تا سوچی ئەوسەریش کامێرای چاودێریمان داناوە.. لەم سیدیەدا تەواوی کامێراکان هەن، کە تۆ لەگەڵ کەسێکیتردا بە تایبەت هاتوون بۆ

لای من و ئەو دانەبەزیوە، نە هیچ دوکانێک چوویت و نە بە شێنەییش سەیارەت لێخوڕیوە، ڕاستەوخۆو بە خێرایی بۆ لای من هاتووی.. ئیشت چییت بە منە ؟

سەرچڵ(( شڵەژانی زۆرو قسەی پچڕ پچڕ)): نا، من ویستم تەنها بێیتە لای من(( تف قووتدانەوە)) ئیش بکەیت.

تیرۆژ: هەموو سیمات ئەڵێ ڕاست ناکەیت، من خەڵک باش ئەخوێنمەوە، بە داماوم تێ نەگەی!

سەرچڵ(( بەردەوام شڵەژان)): ڕاستییەکەی من عاشقت بووم.

تیرۆژ: لە کوێ منت بینیوە؟

سەرچڵ: بە بەر ئۆفیسەکەتانا ئەهاتم و ئەچووم، ئیتر زۆر سەرنجت ڕاکێشام و بەوجۆرە هاتمە پێشەوە.

تیرۆژ: ئەوەش درۆیەکیتر.. تا ئەوکاتەی من لەوێم ناو ئۆفیسەکە تاریکترە لە دەرەوەو جامخانەش قاوەییە، ئێمە دەرەوە ئەبینین و دەرەوە نامانبینن.. ئەوەش ڕوخساری عاشق نییە کە من ئەیبینم، پێمووتی ڕاستگۆ بە، پێش ئەوەی سیدییەکە ببێتە بەڵگە لای پۆلیس.

سەرچڵ: نا باوەڕ ناکەم ئەوەم لەگەڵ بکەی؟!

تیرۆژ: بۆ باوەڕ ناکەی؟ چ هەستێکم بۆت هەیە تا باوەڕ نەکەی؟ بەسەری خۆت، لێرە چوومە دەرەوە یەکسەر ئەچم بۆ بنکەی پۆلیس.

سەرچڵ: پێت ئەڵێم..(( تیرۆژ دەست ئەخاتە ژێر چەنەی و گوێی لێ ئەگرێ)) کچێک شێت و شەیدای کاک ئامۆی براتە.

تیرۆژ: واو کاکە ئامۆی تێکەوت!!! زۆر باشە!

سەرچڵ: کاک ئامۆش ئێستا کەمێک پشتگوێی خستووە.. من ویستم لە ڕێگەی هەر جۆرە پەیوەندییەکی خۆم و خۆتەوە بێ، وا لە کاک ئامۆ بکەی شتێک بەو کچە بڵێت، لوتی بشکێنێت و بە یەکجاری لە بیری خۆی بباتەوە.. ئەوە هەموو ئیشەکەم بوو بە تۆ.

تیرۆژ: یەعنی جەنابت ئەوەندە عاشقی ئەو کچەیت، ئامادەبووی لە پێناویا بشگیرێیت؟

سەرچڵ: نا بۆ من نییە، بۆ هاوڕێیەکی زۆر نزیک و زۆر دەوڵەمەندی خۆمە.

تیرۆژ: کەواتە بە پارە ئەمەت کرد!

سەرچڵ: نا وەزعی ماددی منیش زۆر باشەو مەعرەزی سەیارەم هەیە، پارە لە نێوانمانا نییە.. ڕاستیەکەی ئەویش لە ڕێگەی هاوڕێیەکی کچییەوە، کەسێک بۆ من ڕازیی ئەکا.

تیرۆژ (( ئەتریقێتەوە)): وەی باوکەڕۆ پسام.. یەعنی پیاو ئەوەندە داماون؟ هههههه.. من وامئەزانی خەریکی گۆڕین و باشکردنی ژیانی خەڵکن.. کەچی هەموو خەمی ئێوە ڕازیی کردنی دڵی کچێکە؟

سەرچڵ: ئەمە گرنگترە بۆ تاک، من گەر ژیانی سۆزدارییم سەقامگیر بێ، چش لە هەمووی.

تیرۆژ: مادام ئەوە گرنگترە، من ئەوە بە پارە ئەکەم، ئەگینا کاکم هان ئەدەم ڕووی بداتێ و بیهێنێ.

سەرچڵ: کچێ ئەو برادەرەم خۆی ئەکوژێ، هێنانی چی؟

تیرۆژ: دەی کەواتە بیست هەزار دۆلارم بۆ بێنە.

سەرچڵ: واو کەمیش ناڵێ؟!

تیرۆژ: جا ئەوە کەی پارەیە؟ ئەوە هەر بۆ داخ کردنتانەو هیچیتر!

سەرچڵ: ئەوە زۆرە دادە گیان، من نازانم بڵێم چی.. با قسە لەگەڵ خۆیا بکەم.

تیرۆژ(( هەڵئەسێ)): ئۆکەی. من بەیانی چاوەڕوانی وەڵامم.. بەو ژمارەیەی تێلم بۆ کردی، ئەتوانی سەعات ١٠ تێلم بۆ بکەیتەوە.. بای!

سەرچڵ: سیدیەکەت بیر چوو؟!

تیرۆژ: بە تاڵە بۆ خۆت.. کە هاتم لە سەر ڕێگەم کڕیم.

(( تیرۆژ بە پێکەنینێکەوە ئەڕوات و سەرچڵ ئەحەپەسێ و سیدییەکە ئەمدیوەودیە ئەکا بە دەستییەوە.. ئاماژەی گارسۆن ئەکا بۆ حسابەکە))

Cut

دیمەنی – ٨٨٤ – ئێوارەی درەنگ / د – باخی چێشتخانەیەک:

(( زوبێرو نیگارو شەنیاو دەوران.. دانیشتوون لە چاوەڕوانی ژەمدا ))

زوبێر(( بە پێچەوانەی خولقی خۆی، کە شتێک ئەگێڕێتەوە لە گەڵیا تەواو پێ ئەکەنێ و ئەکەوێ بە پشتا، یان هەندێجار بە پێکەنینی بێدەنگ، تەنها بە هەناسە.. هەر لە دەستپێکردنی گێڕانەوەکەوە پێ ئەکەنێ.. تەنها نیگار وەڵامدەرەوەی پێکەنینەکەیەتی، دەوران و شەنیا تەواو بێزارن لە پێکەنینەکەی)): جا کە دەستم برد بۆ لەتە نانی کابرای تەنیشتم، توند مەچەکی گرتم و وتی، ئەرێ برا ئەوە چیت کرد؟ خۆ هەمووو نانەکەی منت خوارد، بۆچی بۆ خۆتی بانگ ناکەی؟

نیگار(( پێکەنین)): ئەی وایە ئەویش بۆ خۆی بانگ کردبوو، وا لە ئێمەش نەکەی ئەمشەو؟

زوبێر(( پێکەنینی زۆر)): ئیتر با بزانین ئەقڵم چی بڕی ئەوە ئەکەم ها ها ها.

شەنیا: دوو سێ مانگە ئەتناسم کاک زوبێر، قەت بە قەدەر ئەم ئێوارەیە دڵخۆش نەبوویت، بە ڕاستی موعجیبم بە پێکەنینەکەت.

دەوران(( خەریکی مۆبایلە بە بەردەوامیی)): زۆر دڵخۆش دیارە، تەنانەت بە شتێکیش پێکەنینی توند ئەیگرێ، کە تۆزێکیتر لەسەری بڕۆیشتایە، من دڵم پڕ ئەبوو.

زوبێر(( پێکەنین)): کچم تۆ لە مەغزای قسەی نەوەی کۆن ناگەیت.. ئەها دایکت ئەزانێ ئەڵێم چی زۆر بە جوانیی ئەشنێتەوە؟ ئیتر کاتێ ئێمە هاونەوە نەبین، کۆدەکانیشمان ئاڵۆزتر ئەبێ.. هیچ بە دووری مەزانە ئەو ڕەمزەی کە بەکاری ئەهێنین لای هەر یەکەمان مەدلولی جیاوازی هەبێ.. بەدڵنیایی ژیانیش بۆ هەریەک لە ئێمە هاوواتا نییە.

نیگار: دەوران و شەنیا بهێڵن پێ بکەنین، مەراق و ئیش کوشتینی.

زوبێر: برادەرێکم چوو بۆ لای دکتۆر هههه باوەڕ ئەکەن فرمێکسی دەستکردو قەترەیەکی بۆ نوسیبوو پێی بگری؟ هههه چونکە چاوی وشک ببۆوە.. ئاخر ئێمە

لەسەردەمێکداین بەرەو ئەوە ئەچین سروشتی خۆمان لەدەست بدەین.. بۆ هیچ شتێک گریانمان نەماوە، پێکەنینمان کوژراوە، ئەو هەموو کوشتنەو ئێمە ئەوەندەمان لە دەست دێ بڵێین واوووو. لەوە زیاتر وایان لێکردووین هەوڵی ڕێگریی کردن لە کوشتن و برسێتیی و تاوان نەدەین، بەڵکو واوێک و بەس، یان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئیمۆجیی دڵتەنگ بوونەکە دابنێین، ئەی ئیتر چۆن چاو وشک نابێتەوە؟ هههههه

شەنیا: بە ڕای تۆ، یان بگرین یان پێبکەنین، ئیتر بەوە گەڕاوینەتەوە بۆ سروشتی خۆمان؟

دەوران: نا بە ڕای من وا گەڕاینەوە بۆ سروشتی خۆمان، نانەکە هات، برسیمانەو نان ئەخۆین.

زوبێر: پێداویستیی فسیۆلۆژییە کچە جوانەکەم، هەڵبەت بەشێکیشە لە سروشتی ئێمە.

شەنیا: ئەی خۆشەویستیی؟

زوبێر: ئۆووووو ئەوە ڕوحەکەیە ههها نانەکەتان وەرگرن.

(( پێکەنین و نان وەرگرتن))

Cut

دیمەنی – ٨٨٥ –ش/د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و ئاواو تیرۆژ دانیشتوون))

نارەوەن(( بۆ تیرۆژ)): باوانم کەمێک ناچیتە ژوورەوە، من و ئاوا دوو قسەی تایبەتمان هەیە؟

تیرۆژ: ئەرێ دایە گیان لە ژوورەوە بووم کاکم و تریفە قسەی تایبەتیان هەبوو دەریان کردم بۆ باخەکە.. باخەکە دەرم ئەکا بۆ کوێ؟

ئاوا(( سوعبەت)): ئەی گوڵی گیان بۆ ناچیتە ئەوبەرەوە سەرێکی نینابەیت هههە.

تیرۆژ(( هەڵئەسێ)): خۆم زانیم لێرەوە بۆ کۆڵانە.

ئاوا: گاڵتەم لەگەڵ کردی دانیشە.

تیرۆژ(( هێمنیی)): نا خۆم نیازم بوو سەرێکی لێ بدەم، بەس زوو دێمەوە ئێوەش زوو تەواو بن.

نارەوەن: بەس وریابە کچێ هیچ قسەت لێ نەکەوێ.

تیرۆژ: شار هەموو شتێ ئەزانن، پێویستیان بە من نەماوە هههە (( ئەچێتە دەرەوە))

ئاوا: فەرموو دایە گیان!

نارەوەن: کوڕم ئەگەر تۆ ئەو میرە گەورەیەیت کە باسی ئەکەن، زوو دەستی نینا بگرەو بڕۆن بۆ وڵاتێک کەس نەتانناسێ، بەخوا شێت ئەبم شتێکت بەسەر بێ.

ئاوا: چۆن بوو ئەم خەیاڵەت بۆ هات نارەوەن؟

نارەوەن: ئەڵێن ئەو میرە باوک و برای نینای کوشتووە، تەماعی لە نینایا بووە.. لەوەوە زۆر ئەترسم.

ئاوا: منیش ئێستا بەدوای ئەو میرەیا ئەگەڕێم باجی نارەوەن، لە خۆڕایی کوڕی خۆت تاوانبار مەکە.. من پارەیەکیشم خەرج کردووە بۆ دۆزینەوەی، کە دۆزیمەوە خۆم

تەسلیمی پۆلیسی ئەکەم.. هەرچەند باوەڕ ناکەم بدۆزرێتەوە، لەوە ئەچێ جێی زۆر قایم بێ.

نارەوەن: یەعنی دڵنیام ئەکەیتەوە هیچ خەمم نەبێ و توشی دڵەڕاوکێ نەبم.

ئاوا: حەیفت نەکرد نارەوەن؟ کوڕەکەت وا ناسیوە؟

نارەوەن: کوڕم من باشت ئەناسم، بەس لە دڵە پاکەکەت ئەترسم باوکت لە خشتەی بردبێ.

ئاوا: چوک.. هیچ خەمت نەبێ، کەس زەفەرم پێ نابا.

(( ئامۆو تریفە دێنە دەرەوە بۆلایان))

Cut

دیمەنی – ٨٨٦ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری و مفەوەزەکەو هەڵشۆ))

بەهێز(( دەنگی خۆی گڕ ئەکا)): بچن دزی بکەن و پارەکەی بهێننەوە بۆ خۆم.. بەوجۆرە بوو دەنگی؟ ئاوا گڕ بوو؟

هەڵشۆ: نەخێر گەورەم، ئەوە دیارە تۆ دەنگی خۆت گڕ کردووە، ئەو هەر خۆی دیار بوو لە دەنگە پڕەکانە نەک گڕ، دەنگی زۆر پڕ بوو ، هەر کە ژمارەم بۆ بهاتایەو گوێم لەو دەنگە بووایە، ئەمزانی ئەوە.

بەهێز: نەتئەزانی ئەو دەنگە دەنگی گەنج بوو یان بەساڵاچوو؟

هەڵشۆ: نا گەورەم باوەڕ ناکەم دەنگی پیر بووبێ.. دەنگی پیر، هەناسە کورت و لەرەیەکی تایبەتی تیایە هی کۆن بوونی ژێییەکانی قوڕگیەتی.. هەموو کەسێ ئەوە ئەناسێتەوە.

بەهێز: زۆر باشە یەعنی لە تەلەفونا باش دەنگی ئەناسیتەوە؟

هەڵشۆ: بێگومان گەورەم.

بەهێز: ئەوە باشە، پاش نیو سەعاتیتر بانگت ئەکەمەوە.. پێنج تەلەفونت بۆ دێت، بزانە کامیان دەنگی لەوەوە نزیکە، هەڵەی تیانەکەی هەڵشۆ، خۆت ئەزانی تاوانەکان بەسەر تۆیا ساغ ئەبنەوە.

هەڵشۆ: بە هیچ جۆرێک هەڵە ناکەم گەورەم، دۆزینەوەی ئەو هەموو تاوانەکانی کوشتن لەسەر من لائەبا.

بەهێز(( زەنگ لێ ئەدا، پۆلیس دێت و تحیە)): هەڵشۆ ببەوە جێی خۆی ، سەردار بێنن.

(( پۆلیس تحیەو چوونە دەرەوەی خۆی و هەڵشۆ.. پاش کەمێک سەردار دێت و لەسەر کورسییەک دایئەنیشێنن))

بەهێز: میر بە تەلەفون فەرمانی پێ ئەکردی؟

سەردار: نەخێر گەورەم، نامەی لە ژێر تەنەکخۆڵی بەردەرگا بۆ دائەنام لە شەوان سەعات ١١ یا.. هەموو شەوێک سەعات ١١ و دوو دەقیقە من ئەبووایە سەیری ژێر تەنەکخۆڵەکە بکەم تا بزانم نامەی هەیە یان نا؟

بەهێز: نامەکانی لە کوێن؟

سەردار: گەورەم ئەبووایە یەکسەر نامەکانی بسوتێنرێن.

بەهێز: چەند تەلەفونی لەگەڵ کردوویت؟

سەردار: بە هیچ جۆرێک.

بەهێز: ڕێی تێ ناچێ، چەندینجار تەلەفونی بۆ هەڵشۆ کردبێ، کە تۆ متمانە پێکراوتری بوویت، کەچی لەگەڵ تۆ نەیکردبێ؟!

سەردار: دیارە تاکتیکی خۆی بووە.

بەهێز: ئەها!!!! تاکتیکی خۆی.. (( دەست بەژێر چەنەی خۆیدا ئەهێنێ)) زۆر باشە، کەواتە تۆ ئەبێ باش دەستوخەتی بناسیتەوە؟!

سەردار: بە هیچ جۆرێک گەورەم، بە کۆمپیوتەر نوسرابوون و پرینت کرابوون.

بەهێز: باشە.. (( کەمێک بێدەنگیی)) ئەی هیچ شەوێک بە فزوڵیەتی خۆت سەعات ١١ خۆت لێ دانەگرت تا بزانی ئەم میرەت کێیە؟

سەردار: بەهیچ جۆرێک گەورەم، چونکە ئەمزانی یەکێک لە پیاوەکانی دایئەنێت و بە چاودێریی کردنم، ئەکوژرام.

بەهێز(( جەڕەس لێ ئەدات، پۆلیس دێت و تحیە)): بیبەوە جێی خۆی.

((پۆلیس تحیەو سەردار پێش ئەدات و ئەیبات))

Cut

دیمەنی – ٨٨٧ – ڕ/ن – ژووری ملازم ئاری:

(( ئاواو ئامۆو ٣ پۆلیس و مفەوەز لە ژوورەوەن، هەر یەکەیان پارچە کاغەزێکیان بەدەستەوەیە ئەیخوێننەوەو بە پیتی ئینگلیزی ئەی بی سی بە مقەبایەکەوە لە ملیانایە.. ئامۆ پیتی " B" یەو ئاوا "D ".. هەموو ئامادەیی خۆیان دەرئەبڕن.. ملازم ئاریش بە پێوەیە))

ئاری: ئێستا هەر یەکەتان ئەوەی نوسراوە بە تەلەفون ئەیڵێتەوە، نابێ لە خوێندنەوە بچێت، ئەبێ وەک قسە کردنی ئاسایی دەرکەوێت.. ئامادەن؟

(( هەموو ئامادەیی دەرئەبڕن))

ئاری: A.

پۆلیس: بەزووترین کات ئەو ئیشە جێبەجێ بکە، ئەگینا کار لە کار ئەترازێ.. هیوای سەرکەوتنت بۆ ئەخوازم.

ئاری(( مۆبایلی لێوەرئەگرێتەوە)): .. بەڵێ گەورەم .. B.(( ئەیداتە دەست ئامۆوە))

ئامۆ: بە زووترین کات ئەو ئیشە جێبەجێ بکە، ئەگینا کار لە کار ئەترازێ.. هیوای سەرکەوتنت بۆ ئەخوازم.

ـــــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٨٨٨ – ڕ/ د – ژووری بەهێز:

(( بەهێز بە پێوە.. هەڵشۆ مۆبایلەکەی بە گوێوەیەو ئامازەی نەخێر ئەکات.. مفەوەز ئەنوسێت ))

بەهێز(( مۆبایلەکەی لێوەرئەگرێت )): زۆر باشە تۆ هیچ شتێک مەڵێ، هەر بە ئامازە هەڵشۆ سەر ئەلەقێنێ، وەک بڵێ باشە)) دەستخۆش.. (( بۆ مۆبایلەکە)) C با بێت.. (( مۆبایلەکە ئەداتەوە بە هەڵشۆ.. هەر زۆر زوو هەڵشۆ ئامازەی نەخێر ئەکا.. وەریئەگرێتەوە)) مولازم ئاری D با بێت.

________ گەڕانەوەی هەیە ________ Cut ________________________

دیمەنی – ٨٨٩ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٨٨٧ – ژووری ملازم ئاری:

ئاوا (( مۆبایلەکە لە ئاری وەرئەگرێت)): بە زووترین کات ئەو ئیشە جێبەجێ بکە، ئەگینا کار لە کار ئەترازێ.. هیوای سەرکەوتنت بۆ ئەخوازم.

Cut

# (( ئەڵقەی چل و سێ))

دیمەنی – ٨٩٠ – ڕ/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی لەگەڵ گوڵزار دانیشتووە، کچێکی جوانی تەمەن ٣٢- ٣٥ ساڵان، قژ درێژ، مۆدێلباز، لەسەر قەنەفەی بەرامبەر بە یەک))

ڕەمزی: چەند جارێک قسەم لەگەڵ کردووە، ڕازی نەئەبوو بێتەوە.. ئاخر سەرۆک کاتی خۆی لە دەست کاک دارەوان هەڵات و نەیویست خوێن بکەوێتە نێوانیانەوە.. لێم نەبیستووە هەرگیز دانی خێر بنێ بە بەرنامەی کاک دارەوانا.. لەبەر ئەوە تا ئەم گروپەمان نەگیرا، بیری لە هاتنەوە نەکردەوە.

گوڵزار: بۆ سەرۆک ئەم پاشایەی ئەناسی کە گیراوە؟

ڕەمزی: نا، بەڵام بەردەوام ئەیوت دەستنێژی دارەوانە بەکەڵک نایەت.

گوڵزار: لەو باوەڕەدای بێینەوە سەرپێی خۆمان؟

ڕەمزی: ڕاستییەکەی من ئەمەوێ لە ئەنجامی ئەو دوو هەڵە گەورەیەی لەو دوو گروپەدا کراو بەهۆیەوە تیاچوون، من بەرنامەی خۆم داڕێژم و ئەوەشم کردووە.

گوڵزار: کەسمان هەیە؟

ڕەمزی: گوڵزار گیان خەمی کەس هەبوون یا نەبوونت نەبێ، تا من هەبم، پەک ناکەوێ.. ئەوی ئەمەوێ بیبینی، زۆر باشم هەڵسەنگاندووە، باوکی بەو پاشایەوە بەسترابۆوە، کە گیراوە.. خۆم هەندێ ئیشم بەم پێ کردووە، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، تەنها وەک یارییەک ئەو شتانەم کردووە.

گوڵزار: تێناگەم.. بۆچی یاریت پێ کردووە؟

ڕەمزی: تا هەموو تواناکانی بۆ خۆم دەربخەم و خاڵی لاوازیشی بزانم.. کوڕێکی کاک دارەوان خاڵی لاوازی ئەم کچەیە.. بەڵام تا ئێستا خۆم وا نیشان نەداوە، ئاگام لەو یارییەی شەنیاو  باوکی و پاشا گیراوەکە هەیە.. هەر دوور بەدوور.

گوڵزار: ئەوەی لەسەر منە چییە؟

ڕەمزی: ئا گوڵزار گیان، من ئەمەوێ هیچ نەکەم تەنها مێشکی ئەو کچە بشڵەقێنم.. وا بکەین ڕاست و ناڕاستی بۆ لە یەکتر جیا نەکرێتەوە.. هەندێ قسەوباس دروست بکەین کە بەشێکی پەیوەندیی بە ڕاستییەکانەوە هەبێت و ئەویتری چیرۆکی خۆمان بێ.

گوڵزار: ئەوە سوودی چییە کاک ڕەمزی، کچێکی شێواو بێتە ناو کارەکانەوە؟

ڕەمزی: گوڵی گیان.. ئێمە بەوە دەستەمۆی ئەکەین، ئیتر ناتوانێ خاوەنی کەسێتیی خۆی بێت، ڕقی لە هەموو شتێک ئەبێتەوە کاتێ بزانێ تەنانەت باوکیشی ناپاکیی لەگەڵ کردووە.. بەمە دەسکەوتی ئێمە چاندنی توندوتیژیی دڵڕەقییە لەو کچەداو ئیشەکانمان ئاسانتر بەڕێ ئەکا.

گوڵزار: هەمان شتتان لەگەڵ منیشا کردووە؟

ڕەمزی: هەهە نا تۆ ئاسان خۆتدا بەدەستتەوە، هەر خۆت دڵڕەق بوویت.

گوڵزار: بەزەیی هاتنەوە بە خەڵکا داماوییە.. وتت ناوی شەنیا بوو؟

ڕەمزی: ئا.. شەنیا.. وا ئەکەم لەم ڕۆژانەیا بیبینیت و ئیتر بەربینە مێشکی، تا خۆی ئەدا بەدەستەوە، باوەڕ ناکەم کاتێکی زۆریشی پێویست بێ.

گوڵزار: لە کوێوە دەست پێ بکەم؟

ڕەمزی: لە کوڕەکەی کاک دارەوانەوە، ئامۆ.. گوایە ئێمە ئەمانەوێ هاوسەرگیریی لەگەڵ بکاو هەوڵی بۆ ئەدەین، هەروەک چۆن هێنامە کارگەکەی نیگارەوە.. ئەم پلانە بۆ دڵخۆشکردنی ئەوە.. دوای ئەوە خۆم توشی شۆکی ئەکەم بەوەی متمانەی بە هیچ کەسێک نەمێنێ، ئەوەیان دواتر ئەیزانی.

Cut

دیمەنی – ٨٩١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٨٨٨ – ژووری بەهێز:

(( هەڵشۆ بە دەست ئاماژە ئەکا، کە ئەویش نییە.. بەهێز مۆبایلەکە دائەخاتەوە))

بەهێز: دڵنیای ئەو دەنگانە هیچیان ئەو نەبوو؟

هەڵشۆ: زۆر دڵنیام گەورەم، جارێ دووانیان ئامۆو ئاوای ژنبرام بوون.

بەهێز: چۆن دەنگیانت ناسیەوە؟

هەڵشۆ(( سوعبەت)): بە سیلەی ڕەحم!!!.. ئەی ژنبرام نیین گەورەم؟

بەهێز: جێی سوعبەت نییە.

هەڵشۆ: ببورە گەورەم.. ڕاستیەکەی من هەمیشە بۆ دەنگی میر ئەگەڕام، هەر تەلەفونێکم بۆ هاتبێ زۆر لێی ورد ئەبوومەوە، کەسم نەبوارد.. ئەنجام دڵنیا بوومەوە کە میر ناسیاوی من نییە، نە ناسیومەو نە ئەمناسێ.

بەهێز: ئەمەش قەرینەیەکی باشە.

Cut

دیمەنی – ٨٩٢ – ڕ/ د – ئۆفیسی گێلاس:

(( تیرۆژ تەنهایەو سەرقاڵی ئیشی کۆمپیوتەرەو تێلی بۆ دێت))

تیرۆژ: بەڵێ کاک سەرچڵ؟

سەرچڵ(( دەنگ)): سڵاو باشیت؟

تیرۆژ: سوپاس.. فەرموو.

سەرچڵ: کاک ڕاماڵ ئەڵێ ئەمەوێ خۆم ببیبینم.

تیرۆژ: لەسەر مەرجەکەم ڕازیی بوو یان نا؟ ئەگەر نا، من نامەوێ ببیبینم.

سەرچڵ: ڕازییە بەڕێز.. بەڵام ئەیەوێ کەمێک دایگری.

تیرۆژ: بە هیچ جۆرێک!

سەرچڵ(( کەمێک غەڵبە غەڵب و، واتە لەگەڵ راماڵ قسە ئەکاو دواتر)): بەڵێ باشە، لە کوێ یەک ببینین؟

تیرۆژ: لە هەمان قاوەخانە.. سەعات ٢ ، لە ئۆفیس دەرئەچم و ئیتر هەر کاتی ڕێگەکەم پێ ئەچێ.

سەرچڵ: باشە بەقوربان، لە خزمەتتاین.

(( تیرۆژ مۆبایل دائەخاتەوەو بزەیەکی گەرم))

Cut

دیمەنی – ٨٩٣ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز لە جێی خۆی دانیشتووە.. ئامۆو ئاوا لەسەر قەنەفەیەک))

بەهێز: نا وەک گومان نا، هەندێ کارڕاییە خۆتان ئەزانن ئیتر لێکۆڵینەوە وایە.

ئاوا: قوربان من دایکی خۆشم گومانم لێ ئەکا، ئیتر ئێوە بۆ نا؟ هههه نازانم چ هەڵسوکەوتێکم شەڕەنگێزانەیە؟ تا چاکی بکەم.

ئامۆ: زۆر ئاساییە لەم تەومژەدا گومان لە هەموو کەسێک بکرێ.

بەهێز: من وەک گومان تەماشای ناکەم ببورن، ڕێسایەکی یاسایی هەیە ئەڵێ تۆمەتبار بێ تاوانە تا ئیدانە ئەکرێ.. جا نەخوازەڵا ئێوەش خەڵکی دیارن.

ئاوا: قوربان گومانەکە گەر هەبێ لەوێوە سەرچاوە ئەگرێ، کە باوک و زاوا هاوبەش بوون لە تاواندا، ئیتر نێرینەکانمان ئەکەونە بەر چاودێریی.. بڕوا بکە نەک ئاسایی وەریئەگرین، بە ڵکو خۆشحاڵین بەوەی کە گومان لە هەر کەسێک هەبێ.

ئامۆ(( هەڵئەسێ)): ببورن، گەر ئەمرێکتان نییە ئێمە بڕۆین کارمان جێهێشتووە.

(( وەڵام و خواحافیزیی و ڕۆیشتنی ئامۆو ئاوا))

Cut

دیمەنی – ٨٩٤ – ڕ/ د – سەرجادەی کەمێک دوور لە کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەمزی بە سەیارە کۆنەکەیەوە وەستاوەو ڕەوەز کەمێک بە پەلە ئەچێتە لای))

ڕەوەز: هەمووی ئامادەیە، کەمێک خێرا یەکێک بنێرە، نەک خۆی بێتەوە.

ڕەمزی: ڕەنگە ئێستا بگەنە لات، ئاگادارم کردوونەتەوە.

(( سەیارەی ئامۆ بەوێدا ئەڕوات، کە ئاواى تیایە.. ئاوا بە لاچاوێک دیقەتی ڕەوەز ئەدات، بە جۆرێک سەرنجی ئامۆش ڕانەکێشێ))

ڕەوەز: کەواتە من بچمەوە کۆمپانیا؟!

ڕەمزی: ئا بچۆ.. ئەو کابرایەی وتت دەرنەکەوتەوە؟

ڕەوەز: خدر؟

ڕەمزی: ئەی کێ ئەڵێم؟

ڕەوەز: دەرنەکەوتووە، بەڵام ئەو حەماڵەی لەوێیە، دڵنیای کردمەوە، کە ئیتر هەر لەو ئۆفیسەی نارەوەن ئەبێت.

ڕەمزی: هەر کاتێ تەواو جێگیر بوو، هەوڵ بدە ئەو حەماڵەو خەڵکیتریش دروستکەیت و ڕایانبسپێری بۆ چاودێریی کردنی.

ڕەوەز: سەرچاو خەمت نەبێ، ئەوە لەسەر من.

ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ٨٩٥ – مربوط – ڕ/د- بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا لە سەیارەکەی ئامۆ دائەبەزێت و کەمێک خۆی دوائەخاو جاروبار سەرنج ئەگرێتە ڕەوەز کە لە دوورەوە بەخێرایی دێتەوە))

ئاوا: شەو چی ئەکەی؟

ئامۆ: دەعوەتی کاک زوبێرین، درەنگ دێمەوە.

ئاوا: کەڵکی خواردنەوەت بڕاوە (( ڕەوەز ئەگاتە لای)) دەی باشە خوات لەگەڵ.

(( ئامۆ دەستی بۆ بەرز ئەکاتەوە))

ڕەوەز: لەگەڵ خاڵم بووم.

ئاوا(( پێکەنین)): جا ئەوە پەیوەندیی چییە بە منەوە، ئەمجارە لەگەڵ مامت بە.

ڕەوەز: مامم نییە.

ئاوا: ئەها، یەعنی تۆش بێ مامی وەک خۆم. هههە.

(( بەرەو کۆمپانیا ئەچن))

Cut

دیمەنی – ٨٩٦ – ڕ/ د – بەردەم بنکەی پۆلیس:

(( ئاکۆ بەرەو بنکەکە دێت و نیناو گێلاس دڵخۆش دێنە دەرەوەو یەک ئەگرنەوە))

ئاکۆ: خۆ هیچی ناخۆش نییە؟

گێلاس: نەوەڵا ئەوەندە شتی باش هەیە هەر مەپرسە.

نینا: پورم پارەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە کاک ئاکۆ.

ئاکۆ(( دڵخۆش)): ئەوە بەڕاستتە نینا گیان؟

گێلاس: دزەکان گیراون، سەر بە زاواکەی ماڵی کاک دارەوانن و یەکێکیشیان هاوڕێی شۆڕشی ڕەحمەتییە.

ئاکۆ: هەواڵێکی زۆر خۆش بوو، دەی گێلاس تەدارەک ڕێکخەو ئێوارە نانێکی چەورو نەرممان بۆ دروستکە.

گێلاس: هەر تۆو نان؟ وەی بەسەرچاو.

ئاکۆ: ئەچنەوە بۆ ماڵەوە؟

گێلاس: ئەی تازە درەنگە، ڕەنگە تیرۆژیش ئۆفیسی داخستبێ.

ئاکۆ: کەواتە من هیچ ناخۆم و خۆم بۆ ئێوارە ئامادە ئەکەم، ئەچمەوە بۆ دوکان، ئیشتان نییە؟

((ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٨٩٧ – سەرجادەی بەردەمی ئۆفیسی گێلاس:

(( ڕاکواری دیمەنی – ٨٩٢ ی تیرۆژ.. وەستاوەو دەست لە تەکسییەک ڕائەگرێ و پاش پێوتنی شوێنەکە سەرئەکەوێ))

تیرۆژ: تاکسیی، تاکسیی.. (( سەر لە جامی پێشەوەی سەکن نزیک ئەکاتەوەو لە میوتیدا شوێنەکە ئەڵێ و سەرئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ٨٩٨ – ڕ/ د – ناو سەیارەی گێلاس:

(( نینا .. گێلاس شۆفێرە دڵخۆشن))

نینا: بەڵام ئەفسەرەکە ئەیویست زۆر دڵنیابێت لەوەی من کچی شۆڕشم، بەلامەوە سەیر بوو.

گێلاس: کچێ هەر کەس جوانیەکەت ئەبینێ ئیتر ئەکەوێت موجامەلەت.

نینا: نەبەخوا پورێ، پیاو هەر کە دەمی هەڵهێنایەوە من تێی ئەگەم، ئەم لەو بابەتە نەبوو، بگرە دووریش بوو لەوجۆرە سەیر کردنە.. هەستمکرد شتێک بوو پەیوەندیی بە ڕەحمەتیی باوکمەوە بوو، جا هاوڕێی بووبێت، یا ئیشێکیان پێکەوە کردبێ، نازانم.

گێلاس: دڵنیابە هەرچییەک بێ خۆی دەرئەکەوێ.. تۆ ئێستا باسی پارەکە بکە، لە خۆشیا نازانم چی بکەم؟ نازانم کێ پارەکەی دزیوەو بۆ سەردار ناوێک چووەو ئەو چی کردووەو .........

نینا(( بە سەرسوڕمانەوە قسەی پێ ئەبڕێ)): پورێ وتت سەردار؟

گێلاس: ئا سەردار ناوێکم گوێ لێبوو، کچی من هەقم چییە کێ دزیی، ئەوە ئیشی پۆلیسە، بۆ من گرنگ ئەوەیە دەستم ئەکەوێتەوە.. ئای چیم لێهات نینا، خۆ وەختا بوو جەڵدە لێمبا.

نینا: سەردار هاوڕێی منداڵیی باوکم بوو، ئەو باوکمی هاندا کاتی خۆی بۆ فێڵ لێکردن و بردنی پارەکانت بە ناوی ڕیکلامەوە.. ئەوە دزیش دەرچوو؟

گێلاس: خەتای باوکت بووە کە هێشتوویەتی لە منداڵییەوە ئەوە برادەری بێ.

نینا: نا پورێ لەم ئەخیرەیا وای لێهات، سەرەتا وەک مامم وابوو، کەچی لەم دوادواییەیا هەستم ئەکرد جۆرێک تەماشای ئەکردم و چاوبزیی ئەکردو لەدواوە تەماشای لەش و لاری ئەکردم.

گێلاس: بۆ ژنی نەبوو؟

نینا: ژنەکەی تازە مردبوو، خۆ یادی بەخێر بە باوکیشم وت، کەچی نەئەچووە ئەقڵییەوە.

گێلاس: نیەتی خراپ نەبووە ویستوویەتی بتهێنێ (( تریقەو پێکەنین ))

نینا (( پێکەنین )): جا ئەو پیرەمێردە؟

(( پێکەنین ))

Cut

دیمەنی – ٨٩٩ – ڕ/ د – گوند- دیدەوان:

((تەیفورو دیدەوان کەمێک ڕیشی هەیە لە بەر هەیوانی ماڵی یەکێکیان دانیشتوون))

دیدەوان: بەڵێ هەر هەموویم بۆ بکەرەوە بە پارەو لای خۆت بۆم دابنێ، گەڕامەوە ئەوە ئەگەڕێمەوەو نەشگەڕامەوە، ئەوە با هەر لات بێ.. لەوێشەوە جاروبار کوڕەکە بنێرە، پارەی ترت بۆ ئەنێرم با هەر لات بێ، کەس نازانێ سبەی و دووەی چی ڕووئەدا.

تەیفور: خەمی هیچت نەبێ ماموستا گیان، خۆشم نەمێنم، پارەی تۆ پارێزراوەو تا جانی بنی جان هەر ئەمێنێ.

دیدەوان: نا ئیشەڵڵا تۆ هەر ئەمێنی، خۆ منیش پێتان لێ نابڕم.. ئەو هەموو چاکەیەی تۆ لەم ماوەیەدا لەگەڵما کردت، بە پارە قەرەبوو ناکرێتەوە.

تەیفور: جا چیمکردووە ماموستا گیان، بەخوا حەزم نەئەکرد ئەوەشت لێوەرگرم، بەڵام ئیتر خۆت زۆرت لێکردم.. (( سەیارەیەک دەرئەکەوێ)) ئەوە سەیارەکەی دێیە ماموستا، با بە کوڕەکە بڵێم جانتاو کەلوپەلت بۆ بخاتە سەیارەکەوە.

دیدەوان(( هەڵئەسێ)): ئەرێ وەڵا ماڵ ئاوا بێ، لە کاتی خۆیا گەیشت.

تەیفور: لەبەر شار ئێمەت بیرنەچێ ماموستا، بەخوا ئێمە ئەو کاتەمان پێ خۆشە جەنابت لە ناومانا بیت.

دیدەوان: ئەوە من نیم چاکەی ئێوەو دانیشتنە جوانەکانتانم بیر بچێتەوە، دڵنیابە زۆریش بیرتان ئەکەم.

(( بەرەو سەیارەکە ئەچن و کوڕەکەش جانتاو کەلوپەلەکانی ئەخاتە سەیارەکەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٠٠ – ڕ/ د – بەردەمی چاخانەی هاوڕێ:

(( حەمە خدر بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەچێت.. ئەردەڵان دانیشتووە چای دیژلەمە ئەخواتەوە، هەر کە چاوی بە خدر ئەکەوێ لە سەیارەکەی دائەبەزێت و بەرەو ئۆفیس ئەچێ، بە پەلە ژێرپیاڵەکە دائەنێت و کلۆکە هەر لەدەمیایە، بۆ هاوڕێ))

ئەردەڵان(( بەدەم ئەمدیودیو کردنی کلۆکەوە)): بیبینە، سەیریکە سەیریکە چۆن ملی بردۆتە ناوەوەو بەرەو لای نارەوەن.. چیموت؟ چیموت؟ نەموت ئا لەم چەند ڕۆژەیا دەرئەکەوێتەوە؟ (( کلۆکە ئەپەڕێتە قوڕگی و کۆکەکۆک))

هاوڕێ: ئەک یارەبی لەبینت گیرێ، چونکە ئەوەندە بوختانچیت!

ئەردەڵان(( دوای دەرهێنانەوەی کلۆکە)): ئاخر بوختانی چی ناپەسەند؟ پێموتی نارەوەن دەرکەوتەوەو ئەو هەتیوەش دەرئەکەوێتەوە، ئەوە قسەکەم هاتە دی.. کورە من تاڵ بە تاڵی سەری ئەو هەتیوە شارەزام.

هاوڕێ(( پێکەنین)): جا خۆ سەری ئەوەنەی پێوە نییە هەهەهەهە.

ئەردەڵان: مەبەستم ئەوەیە باشی ئەناسم. (( خدر لە ئۆفیسەوە بەرەو لایان دێت))

هاوڕێ (( بە ئامازە وەک پێی بڵێ بوەستە پێی ئەڵێم)): جا باشی ئەناسیت؟ ئەوە هات!

ئەردەڵان: هەر زۆر باشیش.

خدر(( ئەگاتە لایان)): ئەوە باسی چی ئەکەن؟

هاوڕێ: ئیتر ئەردەڵانە ئەمجارە باسی تۆ ئەکا.. (( ئەردەڵان ئەشڵەژێ))

خدر: ئەڵێ چی؟

هاوڕێ(( سەیری ئەردەڵان ئەکات، وەک ئەوەی بڵێ بیڵێم)): ئەڵێ مۆڵەتەکەی تەواو؟

Cut

دیمەنی – ٩٠١ – ڕ/ن – قاوەخانە:

(( ڕامانڵ و سەرچڵ چاوەڕوانی تیرۆژ ئەکەن، پاش کەمێک تیرۆژ دێت، بە ماکیاژی تەواو و جلوبەرگی دیمەنی – ٨٩٢ – ەوە ))

ڕامانڵ (( توشی سەرسوڕمان ئەبێت )): واو ئەوە چییە؟

سەرچڵ: هەر نەڵێی جوانە باشە؟

ڕامانڵ: نا ناڵێم جوانە، ئەڵێم جوانییەکەی خەیاڵییە. (( خەندەی سەرچڵ و گەیشتنی تیرۆژو سڵاوێکی کورت ))

تیرۆژ: پارەکە حازرە؟

ڕامانڵ: نا.

تیرۆژ: ئەمزانی حازر نییە.

ڕامانڵ(( زەرفێکی بە قەبارەی دوو دەفتەرەکە پێ نیشان ئەدا )): ئەوە پارەکەیە، نەتزانی. بەڵام تەواو لە ئێستاوە ئەتوانی بچیتەوە بە براکەت بڵێی شەنیا بێنێ.. منیش بەڵێنت ئەدەمێ دوورو نزیک ناوی نەهێنم.

تیرۆژ: ئەم گۆڕانە لە پڕە چی بوو؟

ڕامانڵ: ئەگەر تەنها بە هاوڕێیەتی من ڕازی بیت، وانەیەکی گرنگت پێوتمەوە، لە داهاتوودا ئەزانیت ئەو وانە گرنگەی هەموو ڕوانینی گۆڕیم چی بوو.. کە هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم هیچ شتێک بتوانێ بیرکردنەوەم سەبارەت بە شەنیا بگۆڕێ.

تیرۆژ: واو! بەخۆم نەزانیوە وانەش ئەڵێمەوە؟

سەرچڵ: وەڵاهی من وامزانی پارەکەت ئەداتێ و ئەڕۆین.. ئیتر نازانم چیت لێ تێگەیشت؟

ڕامانڵ: هەر زۆر.. ئەکرێ داواکەم ڕەت نەکەیتەوە بۆ هاوڕێیەتی؟ خۆت سەرپشک بە.

تیرۆژ(( خەندە )): ئەی خۆ تۆ سەرپشک ناکەم هههه!. بیری لێ ئەکەمەوە.

ڕاماڵ(( پارەکە ئەخاتە بەردەستی )): وا نەزانی مەبەستم نەدانی پارەکە بێت.. ئەوە با دیاریی من بێ بۆ تۆ، ئەگەر قبوڵی بکەی؟!

تیرۆژ: خراپ نییە، بەڵام پارە ناکرێتە دیاریی! تۆ ئەڵێی پارەت دۆزیوەتەوە؟

ڕاماڵ: نەمدۆزیوەتەوە، هەر ئەوەندە هەیە کە ئەزانم چۆن لە جێی خۆیا بەکاری بهێنم و بۆ خزمەتی کێ بەکاری بێنم.

تیرۆژ: ئەی ئەبێ چەندت بۆ شەنیا خەرج کردبێ کە ئاوا بە دڵ خۆشت ویستبێ؟

سەرچڵ: کچێ تۆ ئەڵێی چی؟ بڕوا بکە پارەی خانوویەکی تێچووە.. کەچی هەر هەناسەیەکی کاک ئامۆ بە هەموو دنیا نادا.

تیرۆژ: کاکم ئەهێنێ.

ڕاماڵ: قەیچێکا با من نەهێنم . هههه.

تیرۆژ(( دەست بە دەمیەوە ئەگرێ و پێکەنین)): ئۆو زۆر ببورە کاکە ڕاماڵ بەخوا بێ مەبەست بوو.

ڕاماڵ: قوربانی تۆ.. ئاساییە.

تیرۆژ: بۆ دڵی گەورەت ١٠% ی هاوڕێیەتیت قبوڵکرا، ئەویتریشی دەرفەتم بەرێ بۆ بیرکردنەوە.. ئەها چەند دڵم باشە؟ هههه

ڕاماڵ: ١٠٠% قبوڵە هەر بڕیارێک بدەیت.

تیرۆژ: ئێوە هەر ئەو دووەن یان هاوڕێی کچیشتان هەیە، شتێکی وام بیستووە هەهە.

ڕاماڵ: بە جار کەوتووە، لە زۆرترین باردا تەنیام و هاوڕێی کچیشمان هەن.. چۆنت بوێ ئاوا دائەنیشین.

تیرۆژ: باشە بڕیاری لێ ئەدەین. با بزانین چۆن ئەکەوێتەوە.

ڕامالْ: بە هیوام نارەحەت نەبووبێ بە قسەکانمان!

تیرۆژ(( هەلْئەسێ)): ئەبێ بڕۆم، دایکم ئەزانێ کاتی گەڕانەوەمە لە ئۆفیس.

(( خواحافیزیی کورت، بێ تەوقە))

ڕامالْ: دایکت ژنی مالْەوەیە؟

تیرۆژ: نەوەڵا قوربان شەواو شەو ئەیبینم هههه.

سەرچلْ: هەروا فێلْبازیت هههه.

تیرۆژ(( بزە)): بای!!

(( ڕۆشتنی تیرۆژ))

ڕامالْ: بۆ ئەم کچە تەرکی دنیا ئەکەم.

سەرچلْ: دەی ئینجا نۆرەی ئەمە؟!

Cut

دیمەنی – ٩٠٢ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر لە دەرەوە دێتەوە ڕووخۆشەو چیمەن بەخێرهاتنەوەی ئەکا ))

چیمەن: خێر مامۆستا؟ دڵت خۆشە!

زوبێر: ڕێک ئیدیۆمی مەڕو بزنەکەیە، ئەها منیش یەکجار دڵخۆش بم ئەکرێ بە هەرا هههە.

چیمەن: ئاخر تۆ زۆر کەم ڕازیت لەو شتانەی ڕووئەدەن.

زوبێر: نا ئەمجارە تۆش بەشداریی ئەو دڵخۆشییەم ئەکەیت و ڕازیی ئەبیت.

چیمەن: حەتمەن مەوعیدی نیگارخانت هەیە؟!

زوبێر(( قاقا)): کچێ ئەوە تەواو، ڕەنگە هەموو ئێوارەیەک ئیتر مەوعیدم هەبێ لەگەڵیا، وایە، کەمێک پێش ئێستاش هات بۆ بینینی ئیشەکانی خەستەخانەکەو زۆر بە دووقۆڵیی دانیشتین، بۆ ئێوارەش دەعوەتی ئەوم نایەمەوە.

چیمەن: واو پیرۆزە پیرۆزە، ئەوە هەر زۆر گرنگ بوو، چەند خۆشە دێین و پێکەوە ئەتانبینین.

زوبێر: نا جارێ ئەو قسانە نەکراوە.. بەڵام ئەو شەوە تێستێکی دەروونییم کرد بۆ خۆی و کچەکەی، خۆی زۆر باش دەرچوو.

چیمەن: چۆن؟ باوکە.

زوبێر: شتی ئاساییم بۆ ئەگێڕایەوەو لەگەڵ قسەکانا زۆر پێئەکەنیم، بۆ ئەوەی ئاستی بەدەنگەوەهاتن و کاریگەرێتیی خۆم بزانم، ئەو زۆر باش ئەهات بە دەممەوەو بێ ئەوەی بزانێ زۆر پێئەکەنی.

چیمەن: ئەی کچەکەی؟

زوبێر: نا ئەو نەک هەر وەکو دایکی نەبوو، بەڵکو سفری هێنا.. واتە گەر هاوسەرگیریی بکەین و کچەکەی لەسەرماڵ بێ ناحەسێینەوەو ئەبێ دواتر جیا بینەوە.. کەواتە زووە.

چیمەن: ڕقی لێتە؟

زوبێر: نا هەست ئەکا دایکی زەوت ئەکەم و لە خۆشەویستیی دایکی دائەبڕێ.. بەڵام گەر ئەو ئەمڕۆ بڕوا بەڕێی خۆیەوە، من سبەی داوای ئەکەم هههە.

چیمەن: ئای کە تۆ سوودت لەو سایکۆلۆژیاو دەروونشیکارییە بینیوە.

زوبێر: هەر ئەوەش خستمیە زیندانەوە با بزانی.. دەی با هۆکاری دڵخۆشییەکەمت پێ بڵێم.

چیمەن: فەرموو، ئەبێ چی لە نیگارخان گرنگتر بێ؟

زوبێر: ڕێژوانم هێنایەوە لای خۆم بۆ خەستەخانەکە.. ئەیرەتێنم ئەوەندە ئیش ئەدەم بەسەریا.. چووم دوکانیشم بە سەلوا داخست و ناردمەوە بۆماڵەوە، وتم جارێ تۆ ژنی ماڵەوە بەو هیچیتر.

چیمەن: جا بەوە چارەسەر ئەبن؟

زوبێر: نا کچم، ئەوە هەنگاوێکە بۆ دۆزینەوەی دەردەکەی ڕێژوان، لەژێر دەستی خۆما بێ زووتر دەردەکەیم بۆ دەرئەکەوێ.

چیمەن(( بە اعجابەوە)): ئای باوکااااا!

زوبێر: ئەی چۆن؟ باوە گیان، لە زوبێری باوکتەوە شتێ فێر بە.. دە ئەگەر ئەتوانی نانەکەش بێنە، یان خۆم ئەیهێنم بۆ هەردووکمان.

چیمەن: نا نا زۆر باشم باوە! من ئەیهێنم.

(( چیمەن ئەچێتە مطبخ و زوبێر بۆ مغسل))

Cut

دیمەنی – ٩٠٣ – ڕ/ د – ناو بازاڕ:

(( نینا ئەچێتە کۆگایەکی جل و بەرگی پیاوانەوە، قاتی مارکەی هەیە.. بە ناو قاتەکاندا ئەگەڕێت و قاتێک دیاری ئەکات، بە پێی قەدو باڵای خاوەنەکەی وەسفی ئاوا ئەکات، واتە وەک تۆ، یان کەمێک باڵا بەرزتر، کورتتر، قەڵەوترو زەعیفتر، قیاسی ئاوا بەوجۆرە دائەنێت و قاتەکە ئەکڕێت، داوای کراس و بۆینباخیشی بۆ ئەکات، ئەگەر گۆرەویی و پێڵاویش هەبێت))

نینا: خۆ ئەگەر بۆی نەبوو، ئەتوانین بیگۆڕین بە سایزێکیتر.

دوکاندار: بەڵێ وەرگرتنەوەمان نییە، بەڵام تا هەفتەیتریش ئەتوانن بیگۆڕن.

(( جلەکانی بۆ ئامادە ئەکەن و پارە ئەدات و بە تاکسییەک ئەڕواتەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٠٤ – ڕ/ن - ئۆفیسی نیگار:

(( نیگار دانیشتووەو ڕەمزی چەند لاپەڕەیەکی لەژێر دەستایەو بەپێوەیە شت ئەنوسێت، تەواو ئەبێت و کاغەزەکان ڕێک ئەخاتەوە))

ڕەمزی: ئیتر ئەوە هەموویەتی.

نیگار(( هەندێ شت ئەنوسێ)): هێشتا خێری زۆر کردووە.. ١٢% ی بکە بە پاداشتی کرێکارەکان.. تۆو شەنیاش هەریەکەتان ٥%.. ٢٥% یشی بگێڕەوە بۆ کاک زوبێر.. وەک هاوکاریی نەخۆشخانەکە.

ڕەمزی: ئەوەی من و شەنیا زۆرە نیگار خان.. نەخۆشخانەکەس خێرخوازیی نییە تا هاوکاریی بکەیت.

نیگار: ئێمە لە زەرەرەوە بگەینە ئەو پارەیەو ٥٣% ی بۆ من بمێنێتەوە زۆرە.. ئێوەش نۆشی گیانتان بێ، هیچ ئیشێکمان ئەوەندە دەنگە دەنگی لەسەر نەکراوە هههە با ئەو پاداشتە بۆ سەرێشەکەتان بێ هههە.

ڕەمزی: هەهە زۆر سوپاس، دەستخۆش.

نیگار(( هەڵئەسێ)): لای ژمێریارەکە ئەو پارەیەی کاک زوبێرو ئامۆم بۆ وەرگرە، ئەچم بۆیان ئەبەم.. من ئەچمە سەیارەکەوە.

ڕەمزی: سەرچاو، هەر ئێستا.

(( ڕەمزی ئەچێتەوە دەرەوەو نیگار خۆی ئامادە ئەکا، خۆی ڕێک ئەخاتەوە ))

Cut

| | |
|---|---|
| دیمەنی – ٩٠٥ – ش/ن / ژووری تیرۆژ:<br>(( تیرۆژ بە جلی ماڵەوە تێل ئەکا، بە دەنگی نزمتر لە ئاسایی قسە ئەکا، دواى سڵاو))<br>تیرۆژ: !١- کاتت هەیە؟............ ٢- هەههههه هەر زۆر باشە بۆ من............ ٣- نا خۆپەرست نیم، ئەگەر بۆ تۆ باش بێت هاوڕێیەتیت بکەم ..........<br>٤- نەمووتوە نا، ئەڵێم ڕازیم، بە ڵام مەجدارە .......... ٥- یەکەم من کاتی زۆرم نییەو ناتوانم بەردەوام هاوڕێت بم، کارم هەیەو ماڵی ئێمەش تا دڵنیا نەبنەوە لەوەی کچیان بۆ کوێ ئەچێ، ناهێڵن بچێتە دەرەوە................. ٦- نا، من فێڵ لە دایک و برام ناکەم، دووەم، لە خۆت زیاتر نامەوێ هاوڕێی کەسیتر بم، هاوڕێی من دیاریکراوە، بەربڵاو نییە.. هەر دانیشتنێکیش ناتوانم لە نیو سەعات زیاتر بمێنمەوە.......... ٧- دڵم ناسکە، ئاگاداری دەمودووت بە.......... ٨- تۆ قەت تەلەفونم بۆ ناکەیت، هەر کاتێک ویستم دانیشین، خۆم تێلت بۆ ئەکەم........... ٩- هیچم نەما.. کاتم نەما، هەموو لە باخەکەن وا یەکێکیان هاتە ژوورەوە، تۆش بخەوە شەوت شاد<br>(( تیرۆژ تەلەفونەکە دائەخات و بزەی گەرم.. هەڵئەسێ بۆ دەرەوە))<br>Cut | دیمەنی – ٩٠٦ – ش/د – باخی نادی:<br>(( ڕاماڵ لەگەڵ زاهید دانیشتووە، خواردنەوە، هەڵئەسێت و ئەچێتە لایەکەوە، دواى وەڵامی سڵاو))<br>ڕاماڵ: ١- هەموو کاتم بۆ تۆیە، خوا بکا گەیشتبیتە بڕیارێکی باش......... ٢- نا تکایە، با بۆ منیش باش بێ، خۆپەرست مەبە، باشییەکان دابەشکە................. ٣- (( قسەکەی پێ ئەبڕێ)) تکایە نەڵێی نا.............. ٤- مەرجی تۆ سەر سەروچاوم، سوپاس بۆ ڕازیبوونت، هەرچییەک بێ وائەکەم ............ ٥- ئاسانە، بە پێی کاتی تۆ دائەنیشین، جاروباریش خۆت شارەزای، وردە فێڵیش هەر هەیە.............. ٦- زۆرم پێخۆشە، منیش حەزم بە تێکەڵاویی زۆر نییە ..............<br>٧- ئەگەر مەبەستت قسە کردنمە، دڵنیابە شتێک ناڵێم نیگەران بیت........... ٨- سەرچاوم تیرۆژ خان، قبوڵە.............. ٩- خوا حاف ....<br>ڕاماڵ: خۆ دایخستەوە.. تۆ بڵێی ئەمیش وەک شەنیام لێ بکا؟ باشترە وەک ئەو زۆر نەیەم بە دەمییەوە.(( ئەگەڕێتەوەو بۆ لای زاهید)) ببورە زاهید گیان.. ئەو کچە بوو بۆم باسکردی.<br>زاهید: ئێ.. ئادەی؟! چی وت؟<br>Cut |

دیمەنی – ٩٠٧ – ش/د – باخی چێشتخانەیەک:

(( زوبێرو نیگار دانیشتوون))

زوبێر(( تەماشای سەعاتەکەی دەستی ئەکا)): کەمێکیش درەنگمان کرد، نەهاتنەوە.

نیگار: کورە ئەوە ئامۆیان دەسکەوتووە بیانگێڕێ، باوەڕ مەکە وا زوو بێنەوە.. بێتاقەت بوویت؟

زوبێر: ئەوە قسەیە تۆ هەبیت و من بێتاقەت بم؟ خۆشترین کاتی منە.

نیگار(( بە شەرمێکەوە سەردائەخا)): سوپاس.. یاخوا هەمیشە دڵخۆش بیت.

زوبێر: نیگار ئەزانی مرۆڤ تایبەتمەندێتییەکی زۆر باشی هەیە، ئەویش پەیام ناردنە لە ڕێگەی شەپۆلەکانی مێشکییەوە.. ڕەنگە زۆرجار خۆمان بە ڕوونیی لێی حاڵیی نەبین یان ئەو شەپۆلانە نەناسینەوە، یان هەستیان پێ نەکەین، بەڵام کاری خۆیان ئەکەن.

نیگار(( وا خۆی نیشان ئەدا کە تێئەگا)): وەکو چی؟

زوبێر: بۆ نمونە لە خۆشویستنی یەکتردا پێشوازیی مێشک زۆر چالاکترە، زوو لە بەرامبەرەکەتی وەرئەگری و دەمودەست وەڵامیشی ئەدەیتەوە.. لەو باوەڕەدام پەیام نێرەرەکەش پێشوازیی چالاکەو زوو وەڵامی خۆی وەرئەگرێتەوە بە قبووڵکردن یان ڕەتکردنەوە.

نیگار(( بە شەرمەوە)): باش تێ ناگەم.

زوبێر(( بە خەندەی ڕوونەوە)): گاڵتە ئەکەی هههه (( نیگار پێ ئەکەنێ و خۆی بە زنجیر یان قایشی جانتاکەیەوە خەریک ئەکا)) کوا لەو تەمەنەیا ماوین درەنگ حاڵیی بین.. من بە هەموو ئەو شەپۆلانەیا لە هەستی تۆش ئەگەم.. ڕاستت بوێ، لەمەوبەریش هەرکاتێ بینیومی وامزانیووە بە وشە هەستی خۆم پێوتوویت و بە وشەو لە چاوە جوانەکانتەوە وەڵامت داومەتەوە.

نیگار: زۆر دڵنیا مەبە لە پێشبینییەکانت.

زوبێر: ئەوە پێشبینی نییە گوڵم، بە زمانی سادەی خۆمان پێی ئەڵێین قسەی دڵە، بەڵام من کێشەکەم شتێکیترە نەک چاوەڕوانیی وەڵامیی تۆ.

نیگار: خێر بۆ خوانەخواست مایەی کێشەیەکم بۆ تۆ؟

زوبێر: نا گیانی من، لەگەڵ تۆ ژیان یەک مانا ئەچنێ، ئەویش ئاسوودەییە.. بەڵام هەستێکیشم هەیە هاوسەرگیریمان ببێتە کێشەیەک بۆ کچەکە، بۆ دەوران گیان.

نیگار: بۆ ئەبێتە کێشە بۆ دەوران؟

زوبێر: لەو کاتەدا هەست ئەکا خۆشەویستییەکەی دایکی ئەبێ بە دوو بەشەوە، هەروایە نیوەی بە ئاشکرا بە من ئەبەخشی.

نیگار: بەڵام هیچ کاریگەریی نابێت بۆ ئەو.

زوبێر: هەر لەبەر ئەوەشە پەلەم نەکردووە.

نیگار: بۆ پەلە نەکردنت زۆر باشت کردووە.. من ئەمشەو ئەگەر دڵنیای هاوڕێی بڕواتەوە، بە ڕاشکاویی لەگەڵیا قسە ئەکەم.. باوەڕ ناکەم بە هیچ جۆرێک دەست بهێنێتە ڕێم.. دەوران زۆر بە ئاگایە کاک زوبێ (( زوبێر بە چاوی توانجەوە، وەک پێی بڵێ کاکی چی؟)) ببورە با جارێ زمانم هەروا ڕابێ، لەبەر مناڵەکان.

(( دەوران و ئامۆو دڵنیا، بە گورج و گۆڵیی دێنەوە سەر مێزەکەو قەرەباڵغیی سڵاو کردن دروست ئەکەن))

نیگار: ها؟! جەوەکەت بە دڵ بوو؟

دەوران: هەر زۆر خۆش بوو، ئامۆ نەبووایە هەر نەئەهاتینەوە، وتی با بچینەوە بەلای ئەو پیرەمێردو پیرێژنەوە، دەمێکە جێمان هێشتوون.

زوبێر(( بە تەماشای پڕ توانجەوە)): ئامۆ وایلێهات؟؟؟؟

نیگار: نا ئامۆ گیان شتی وای نەوتووە، من قسەی کچی خۆم ئەناسمەوە، ڕۆژ نییە دەجار پێم نەڵێ پیرێژن، گوێی نادەمێ، قسەی دڵی نییە.

دەوران: قسەی دڵی چی؟ ئەی دایم پێت ناڵێم بۆ شوو ناکەی؟

(( پێکەنینی هەمووان))

دڵنیا: جێی شەنیا خاڵیی، خۆزگە ئەویشمان لەگەڵ بووایە زۆر خۆشتر ئەبوو.

(( دەوران و ئامۆ تەماشایەکی یەکتر ئەکەن، ئامۆ بە لووت بەرزکردنەوەیەک ئاماژەی بەدڵ نەبوون لە قسەکەی دڵنیا ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٩٠٨ – ش/ن –ماڵی ڕێژوان:

(( ڕێژوان زۆر ماندووە دێتە ژوورەوە، سەلوا بەرەو پیری ئەچێت و بەخێرهاتنەوەی ئەکات و ئەویش لەژێر لێوەوە وەڵامی ئەداتەوە))

سەلوا(( بە خەندەوە)): ئەمڕۆ نەمئەزانی بەچییەوە  خۆم سەرقاڵکەم، باش بوو سەوزەکە هات و کەرەستەی یاپراخم کڕی، یەک یاپراخی سڵقم بۆ لێناوی دەست و پەنجەی پێوە ئەخۆی.

ڕێژوان(( گرژو ماندوو)): من ئەچم ئەخەوم، برسیم نییە. (( ئەچێتە ژوورێکیتر))

(( سەلوا ئاخ هەڵئەکێشێ و لە خەفەتا بە ڕقەوە ئانیشک ئەخاتە سەر دەسکێکی قەنەفەکەو دەست ئەخاتە ژێر چەنەی.))

Cut

دیمەنی – ٩٠٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن لە پشتی مێز دائەنیشێ.. تەماشای سەعات ئەکا، سەعاتی دەستی و سەعاتی دیوار، سەعات دەو ٢٥ دەقەیە، قەلەقە، عەینەک ئەکاتە چاوی و تەماشای کۆمپیوتەر ئەکا، دایئەخاتەوەو دەست بە قژیا ئەهێنێ و دەم لێوی ئەگەزێ و هێمای قەلەقیی.. پاش کەمێک خدر دێتە ژوورەوە، نارەوەن بە پەلە هەڵئەسێت و ئەچێتە بەردەمی))

نارەوەن: چی بوو؟ دڵنیامکە.

# (( ئەڵقەی چل و چوار))

خدر: زۆر باشە هیچی ئەوتۆ نییە.. لە تێستی دەنگەکە سەرکەوتوو بووەو کۆی چاودێرییەکانیش خراپ نیین.

نارەوەن: بەساقەوبم حەمە خدر گیان، ئەمجارەش فریامکەوە، چۆن تریفەت ڕزگار کرد، ئاواشم وا بۆ ڕزگار بکە دەخیلت بم.

خدر: زۆر خۆت شێواندووە نارەگیان، بەوجۆرە نییە تۆ بیری لێ ئەکەیتەوە، مادام دەنگی لە میر نەچووە، من وا خەریکە لە گومانکردنەکەم پەشیمان بم.. ڕاستە ئاوا کەمێک هەڵەشەو دەمارگیرە، بەڵام ناکرێت باوک بەوجۆرە کوڕی خۆی ڕووبەڕووی مەترسیی بکاتەوە.. چوک، قەت ناچێتە ئەقڵمەوە دارەوان ئیشێکی وای پێڕاسپاردبێ.

نارەوەن(( لەسەر قەنەفەیەک دائەنیشێ)): من هەر لەو باسەی کوشتنی باوک و برای نینا ئەترسم، کە میرە ناموبارەکەکە هەڵشۆی بۆ ڕاسپاردووە.

خدر(( ئەچێتە بەرامبەری یان تەنیشتی)): لەوبڕوایەدام گومانی پۆلیسیش تەنها ئەوەبێ، جگە لەوەی کە باوەڕ وایە ئەگەر باوکێک زاوای خۆی بخاتە مەترسییەوە، بۆی هەیە کوڕیشی خستبێ.. لەبەرئەوە تێستی دەنگی هەردووکیان کرا.

نارەوەن: تۆ هەر خێرو بەرەکەتی بۆ من خدرگیان، کەمێک دڵت ئارام کردمەوە، خوا هەرچی چاکە ئەوە بێنێتە ڕێگەت یارەبی.

خدر: ئەو نزا خێرە بۆ نەناس بکە نارەگیان، تۆ هەموو شتێکی منیت، ئەزانی لە چ کاتێکدا نیهێنی منت پاراست و دەستگیرۆییت کردم و دەستت خستە ژێر باڵم، من چاکەو گەورەیی تۆ لەبیر ناکەم هەرگیز.. دڵنیابە هەموو کاتێک لە بەرچاوم، هەر ئەوکاتەیە کە مەعرەزو جێ تەلەفزیۆنم بۆ ئەگواستییەوەو باخم بۆ چاک ئەکردی.

نارەوەن: قوربانی تۆ بم، بەڕای تۆ ئێستا داوای کچەکەی بۆ بکەم؟

خدر: زۆر کاتی خۆیەتی.. خۆ کچە نەیزانیوە باوک و براکەی کوژراون؟ هەر وا ئەزانێ بە ڕێکەوت مردبن؟

نارەوەن: نا هیچی پێوە دیار نییە، دوێنێ شەو شیرینیی دەرکەوتنەوەی پارە دزراوەکەی گێلاسی بۆ هێناین، قەدەرێکی باشیش پێکەوە قسەمان کرد.. قوربانی بم، قاتی سەرتاپای بۆ ئاواش کڕیبوو.

خدر: پیرۆزی بێ، شایانیەتی.. قەیچێکا با کەس قات بۆ ئێمە نەکڕێ.

نارەوەن: کورە با ئەم مەسەلەیە تەواو بێ، قات چییە؟ چیت ئەوێ بە دڵی خۆت داوای بکە.

خدر: دەی باشە، تا ئەو کاتە بیر ئەکەمەوە ها ها ها.

(( پێکەنین و هەستانی نارەوەن بۆ پشتی مێزەکە))

Cut

دیمەنی – ٩١٠ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دیدەوان:

Mute

(( دیدەوان لەبەردەرگا لە تەکسییەک دائەبەزێت و ئەچێتە ژوورەوە))

________ تابع ___________________ Cut ______________________

دیمەنی – ٩١١ – متبوع – ڕ/ن – ناومالّی دیدەوان:

(( دیدەوان کەمێ ڕیشی هەیە هەر بە جلی کوردییەوەیە.. دێتە ژوورەوەو جانتاکەی فڕێ ئەدات و هەندێ پەردە لەسەر قەنەفەیەک لائەبات و دائەنیشێ))

دیدەوان(( لەبەر خۆیەوە)): ئای دارەوانی گۆڕبەگۆڕ، چیت پێ نەکردم؟ (( بزەیەک)) من هاتمەوەو تۆ نەماوی دارەوان!! ئەبووایە پێکەوە بین لە هەموو شتێکا.. بەلاّم لەگەلّ سپلّەو نمەک بەحراما هیچ ناوترێ.. سەیرە بۆ تەنها ئەوم بیرکەوتەوە؟ تۆ بلّێی لەبەرئەوە بێ کە بەهۆی ئەوەوە دەربەدەر بووم؟.... ئێهـ هەرچی ڕۆشت ڕۆشت، بزانین ئەمانیتر چۆن ئەبن؟

(( خۆ گۆڕین بۆ چاکەت و پانتۆلّ کە لە کەنتۆر دەری ئەکاو دۆزینەوەی تاقمی تەراش و چوون بۆ حمام))

Cut

دیمەنی – ٩١٢ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی.. شەنیا وەک خۆ عرض کردن، دەستی خستۆتە پشتی سەریەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتووەو ڕەمزی لەژێر عەینەکەکەیەوە دیقەتی ئەدا ))

شەنیا: من نە باکم بە هیچەو نە لە هیچ شتێکیش ئەسڵەممەوە.. ژیان ئەوەندە بە قورسیی بەڕێم ئەکا، وەک کچێکی ئاسایی بیر ناکەمەوە.

ڕەمزی: ئەگەر بۆ نمونە، ئەمشەو تۆ تەنیا لەماڵەوەیت و چەند دزێک هاتنە سەرت؟

شەنیا: حەز ئەکەی تۆ تاقیکەرەوە هههە دە پانزە برادەری خۆت بنێرە بۆ دزیی، ئەوسا ئەبینی نە دەرگایەکیان بۆ ئەکرێتەوەو نە ئەزانن من لە کوێ نوستووم و نە هیچیشیان دەست ئەکەوێ. هههە.

ڕەمزی: واو، زۆر باشە.. ئەی ئەگەر بە زەبری هێز دەرگایان شکاند؟

شەنیا: ڕەنگە باش لە من حاڵیی نەبووبی کاک ڕەمزی! دڵنیابە کەسیان ناگەڕێنەوە لات.

ڕەمزی: کچێ ئەوەندە خۆت هەڵمەفشێنە هههههە.

شەنیا: خۆ هەڵفشاندن نییە، بڕوا بە خۆ بوونە.

Cut

دیمەنی – ٩١٣ – ڕ/ د – ژێر سەندەویچ پەناڵی نەخۆشخانە:

(( هیچ سەیارەی لێ نییە، زوبێرو ئامۆ پێکەوە وەستاون))

زوبێر: ئەو کچەش باش دیار بوو.

ئامۆ: دڵنیا؟

زوبێر: بەڵێ، زۆر ڕووخۆش و کەیفساز بوو.

ئامۆ: ئەوەندەی لەگەڵیانا چوومە دەرەوە، بەڕاگوزەریی شتێکی لێ تێگەیشتم.. بە ڕاستی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی ئەوم پێ باش نەبوو.

زوبێر: من تەنها وەک ڕووکەش وتم.

ئامۆ: دەوران بۆی باسکردم لەگەڵ پیاوێکی خێزاندارا پەیوەندیی هەیە.. لەلایەکی تریشەوە خۆی بۆ کوڕێکیتر نمایش کردووە، تا پەیوەندیی لەگەڵ ئەو دروست بکا.. کابراش بێ ئاگا بێ ئاگا خەریکە سەر لە خۆی بشێوێنێ.. ڕاستیەکەی یەکسەر لە بەرچاوم کەوت.

زوبێر: سەیرە گەنجێکی وا ئەوەندە نەخۆش بێ، چێژ لە تێکدانی خێزانەکان وەرگرێ.. ئەی بە ڕاستی نیگارت پێ چۆن بوو؟

ئامۆ: ژنێکی خانەدان و باش دیارەو پەروەردەیەکی زۆر تەندروستی کچەکەشی کردووە، زۆر باش هاتە بەرچاوم.. بە ڕاستی ژنە نەک گاڵتە.. کچەکەشی پێرفێکتە.

(( بەدەم دیالۆگەوە پیاسە ئەکەن))

Cut

دیمەنی – ٩١٤ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و ئاواو نیناو تیرۆژ دانیشتوون))

گێلاس: منیش قسەم لەگەڵا کردن، هەردووکیان نینایان سەرپشک کرد.. کەواتە ئەمشەو با داواکردن و مارەبڕین و هەموو شتێک تەواو بێ.. کەس تێمەگەیەنن و هەر خۆمان ئەیبڕینەوە.. ئەو دووە زیاتر بانگ ناکەم بۆ دەسماچ کردنەکە.

ئاوا: باشە. ئێمەش هەر خۆمان و ئەوپەڕی کاک زوبێرو کاک حەمەخدر.. هەرخۆشم ئەچم بەشوێن مامەحەمەو مامەیاسینا.

تیرۆژ: هەر بە جلوبەرگی ئاساییەوە بێین؟

نینا: نەوەڵا خۆ بۆ تەعزێ نایەی؟ هەهە

گێلاس: نا نا ئەوی دێت، با تەواو خۆی بڕازێنێتەوە.

نینا: تیرۆژ فۆتۆگرافەرەکە بێ.. بەس خوام لەوخوایەی ناشرین دەرچم، ڕۆژت بە هەزار چووبێ ئەو دڕکەت لەژێر پێ دەرئەهێنمەوە (( پێکەنینی هەمووان))

ئاوا: تۆ قەت ناشرین دەرناچی، ئەوە بە ملی من (( پێکەنین))

گێلاس: ئیتر بەیانیش بچن بەلای ڕەسمیاتی دادگاوە، ئەویش کاتی ئەوێ.

تیرۆژ: ئەی خۆ هیچیان نەکردووە جارێ، مەگەر ژوورەکەی خۆمیان بەمێ هههە.

ئاوا: پەلەی گواستنەوەمان نییە.

گێلاس: بۆ؟ تاکەی؟

ئاوا: دایکم حەز ئەکا بچینە سەرماڵ و منیش ئەمەوێ نەچین.. ئیتر وا جارێ تیاماوین.

نینا: هەرچەند سەربەخۆ بین باشترەو زووتر پشت بەخۆمان ئەبەستین، بەڵام منیش هەر لای نارەوەن خانم پێ خۆشترە.

گێلاس: هەی زۆرزان، دڵی کەسیان ناشکێنی، هەم لەگەڵ ئەمی هەم لەگەڵ ئەو.

((پێکەنین))

تیرۆژ: منیش حەز ئەکەم بێنە سەرماڵ، خۆ شێت بووم بە تەنیا هەهە

(( دایالۆگ و پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٩١٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو شەنیا ))

نیگار: ئا ئا ئەمشەو قسەم لەگەڵ دەوران کرد، زوبێری پێ پیاوێکی تێگەیشتووەو ئەیوت من پیاوی وام زۆر خۆش ئەوێ.

شەنیا: ئەی بۆ وا گرژو مۆنە لەگەڵیا؟

نیگار: ئەیوت، من ئەمزانی ئەیەوێ لە تۆ نزیک بێتەوە.. بۆیە تا تەواو ڕای تۆ نەزانم چۆن ئەبێ، نەمویستووە وا بزانێ منیش ئەوەم پێ باشە، ئەگینا زۆرم خۆش ئەوێ. دەوران بە ئاگایە شەنیا، ئەها حسابی بۆ چی کردووە؟

شەنیا: بە ئاگایەو زۆر لەو بەئاگا بوونەی خۆشی ڕازییە، ئەزانی؟ هههههە.. ئەی ڕای چی بوو لەسەر ئامۆ؟

نیگار: زۆر زۆر پێی مورتاحە، ئەیوت هەست بە ئارامیی ئەکەم لەگەڵیا، وا ئەزانم برا گەورەیەکم لەگەڵمانایە.

شەنیا(( خۆشحاڵ)): ئەها، یەعنی هەستی خۆشەویستیی نەبوو؟ خوشک و برایانە بوو؟

نیگار: خۆت ئەزانی دەوران شتم لێ ناشارێتەوە، وا بە ئاسانییش سوارچاکی خەونەکانی هەڵنابژێرێ، خۆی وتەنی.

شەنیا: ڕاست ئەکا، ئامۆ لەسەرخۆو نەرمە، کوڕێکی گرانە.

نیگار: وا دیارە تۆش سەروسەودایەکی ئەکەی؟!

شەنیا: نا، هەر ڕێزی یەک ئەگرین و بەس.

نیگار: ئەی ئەگەر ئەمە دنیایە ئەو مەیلی بۆ دەوران هەبوو، پێت چۆنە بیدەمێ؟

شەنیا: ئەوەیان لە دەوران بپرسە، ڕەنگە ئەو ڕای جیاوازی هەبێ.

Cut

دیمەنی – ٩١٦ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

Mute

(( بەهێز بەپێوە، ئاری و مفەوەز دانیشتوون، هەڵشۆش لەسەر کورسییەک.. لە میوتیدا چەند جارێک بەهێز مۆبایلەکە ئەداتە دەستی هەڵشۆوەو ئامازەی نەخێر ئەکات و پاش ماوەی کورت بەهێز پیتیتر داوا ئەکا))

Cut

دیمەنی – ٩١٧ – ش/ن – هۆڵی ماڵی گێلاس:

(( دیمەنەکە سەربەستە))

(( ئاواو نینا بە جلی بووک و زاواوە، نارەوەن و گێلاس و تیرۆژ و سۆماو تریفە بە ڕوخسارو جل و بەرگی ئاهەنگەوە، تریفە غەمبارەو دەستی لەژێر چەنەی، جاروبار تەماشایەکی حەمەخدر ئەکات و ئەویش سەرنجی لەسەریەتی بەکەمیی.. تیرۆژ ڕەسم ئەگرێ.. زوبێرو ئامۆو حەمە خدرو گەنجێک کە مێردی سۆمایەو ناوی ئازادە بە چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباغەوە، دوو پیاوی بە تەمەنیش بە جلی کوردییەوە، مەلا لەمیوتیدا قسە ئەکا.. پاش کەمێک))

مەلا: ئینجا من لە خزمەتتانا مەرەخەس ئەبم، بەڵێنم بە شوێنیتریش داوە (( هەڵئەسێ))

نارەوەن: ئا حەمەخدر گیان ماڵەکەم مامۆستا بگەیەنە.

ئامۆ: نا نا من ئەیگەیەنم.

مەلا: نا کەستان ئەرک مەکێشن سەیارەی خۆم پێیە، ماڵتان ئاوابێ.

(( بەڕێکردن و خواحافیزیی مەلاو ئاهەنگی بچووک))

Cut

دیمەنی – ٩١٨ – ش/ن –ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان نەخۆشیی پێوە دیارە دانیشتوون، کلێپەو باڵا خەریکی میکانۆن))

تافان: پیف لەم ژنە خانەدانە، بە دزییەوە ژن بۆ کوڕی ئەهێێ، یان تۆی لە کولەکەی تەڕیشا بیر ناکەوێتەوە؟

هەندرێن: کچێ ژنەکە تۆ نەخۆشییت، بۆ لە پلار ناکەوی؟ ئینجا با بزانی نارەوەن خانیش حسابی زۆر تایبەتم بۆ ئەکا، باوەڕ ئەکەی هەرچی ئیشی ئەو وەکالەتەیە خۆم ڕایئەپەڕێنم؟

تافان: ئەها! تێگەیشتم، ئەڵێ با هەندرێن گیان ماندوو نەبێ بە هەڵپەڕینەوەو بەیانی لە ئیش دوابکەوێ... کورە ئەوە تۆ قسە بۆ کێ ئەکەی؟ وەڵاهی بەس منم چۆڕێ حسابت بۆ ئەکەم، ئەگینا کەس تۆ ناخوێنێتەوە.. خوشکت دوکان دائەخا، هەر پرسێکیشت پێ ناکا، جارێ نارەوەن نارەوەن، داخی ئەوە لە دڵی منایە ئەو پیرێژنە ڕەزاقورسە، ئێستاش وائەزانێ هەر لە تەمەنی گەنجیایەتی.

هەندرێن: ژنەکە، کچە تازە باوک و برای مردووە و بە پەلە شووی کردووە تا حەیاکەی پارێزراو بێ و کەس باسی نەکا، بۆیە کەسیان بانگ نەکردووە.

تافان: ئەها (( پێکەنین)) ئەمە باوک و برای مردووەو لە تەعزێیایە؟ جا پەلەی شووی چی بوو ماڵکاولە؟

هەندرێن: تو ئەو خوایە! ڕەحمێ ڕەحمێ تافان گیان.

تافان: بۆ؟ چیموتووە؟ ئەگەر شتێ نەبێ تا ئێستا کەست بینیوە لە تەعزێیا شووبکا.

هەندرێن: نا لە تەعزێیا نین، بەس تازەیە.

تافان: ئێ، با هیچ نەبووایە باوک و برای کفنەکەیان زەرد بکردایە، ئەوسا ئەم شووە میراتیەی بکردایە.

(( کلێپەو باڵا دەست لە یارییەکە هەڵئەگرن و هەڵئەسنە سەرپێ بە چەپڵە لێدانەوەو ئەڵێن: هێی هێی، ئەرەوەڵڵا شەڕ))

هەندرێن: ئەها چەند باشت ئەناسن! (( ئەچێتە ژوورێکیتر بە تورەییەوە))

تافان (( بۆ منداڵەکان)): دانیشن ئێوەش عەمرتان نەمێنێ، هەر ئاگر خۆش ئەکەن، (( هەڵئەسێ و دوای هەندرێن ئەکەوێ.. منداڵەکان پێ ئەکەنن)

Cut

دیمەنی – ٩١٩ – ش/ د – ماڵی ڕەمزی:

(( لە دەرگا ئەدرێت و ڕەمزی ئەچێ دەرگا ئەکاتەوەو دیدەوان ئەبینێ.. باوەشی گەرم بە یەکدا ئەکەن و هەواڵپرسین و فەرموو کردن و چوونە ژوورەوە))

ـــــــــ تابع ـــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٩٢٠ – متبوع – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و دیدەوان دێنە ژوورەوەو دانیشتن و دووبارە بەخێرهاتن))

ڕەمزی: من ژێر زەوی بۆ تۆ ئەگەڕام.

دیدەوان: ڕاستە هەر لە ژێر زەویشدا بووم هههە، بەڵام ئێستا کاتی دەرکەوتنەوەیە، لەمەودوا ئیش و کار دەست پێ ئەکا، نەک لەژێر ئەمرونیای ئەو منالْ و مەزمەیا بین.

ڕەمزی: ئیتر دەستنێژی کاک دارەوان بوون.

دیدەوان: هیچ ئیشێکی دارەوان لەمەی جوانتر نەبووە، کە ئاوا دروستی کردن و هەر لە سەرەتاشیەوە گۆڕەکەیان هەڵکەنرابوو.. ئەو کابرایە کەسێکی لە خۆبایی و بیر شڵەژاو بوو، چۆن ئەکرا پشتی پێ ببەستریٰ؟

ڕەمزی: تازە ئەو ڕۆشت و ئێستا من و تۆ ئەبێ بزانین چی ئەکەین، دوای مردوو هیچ نەوتریٰ باشە.

دیدەوان: باشە، لێیگەڕێ.. تۆ لە کوێی بەرپرسیارێتیدای؟

ڕەمزی: سەرەوەی.

دیدەوان: بە دڵمە.. با نەخشەو پلانی یەک ئاگادار بین و بە دەردی ئەوانی پێشوو نەچین ڕەمزی.

ڕەمزی: هەر لەبەرئەوەش بوو کەمێک خۆم لە دەستبەکار بوون ئەدزییەوە.. چاوەڕێم ئەکردی دیدەوان.. بە دەرکەوتنت هەموو شتێک چارەسەر بوو.

دیدەوان: بنەکۆی باشمان هەیە؟

ڕەمزی: لە پارە سڵ مەکەرەوە، لە پێویست زیاترە.. پارەی کەڵەکەبووی پانزەساڵی پێشووتریش کە خۆت و کاک دارەوان پێکەوە ئیشتان ئەکرد، پارێزراوە.

دیدەوان: دەستخۆش.. کەواتە تیمی کارم بۆ باسکە ———— Cut ————

دیمەنی – ٩٢١ – ڕ/ د – ناو نەخۆشخانەی زوبێرو ئامۆ:

(( زوبێر تەلەفونێکی بۆ دێت و بە پەلە وەڵام و داخستنەوە، ئامۆ دانیشتووەو زوبێر هەڵئەسێ))

زوبێر: ئامۆ گیان من ئێستا دێمەوە.

ئامۆ: خێر؟ ئەو تەلەفونە شتێک بوو؟

زوبێر: نا.. هیچی وا نییە، ڕێژوان بە ناوی نەخۆشخانەوە چۆتە دەرەوە.. بزانم چییە؟

ئامۆ: دوای ئەکەوی؟

زوبێر: ئا کێشەیەکیان هەیە لەگەڵ سەلوا، بزانم هیچی لێ هەڵئەکرێنم؟! ورد بە دوایا ئەڕۆم.

ئامۆ(( هەڵئەسێ)): سەیارەکەی من باشترە زۆر سەرنجی نەداوە، ئیشێکی ئەوتۆشمان نییە، پێکەوە بچین، یان سەیارەکەی من ئەبەی؟

زوبێر: ئەگەر ئەرک نییە بۆ نا، پێکەوە بە سەیارەکەی تۆش باشترە.

(( هەردووکیان ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٢٢ – ڕ/ن - ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس و نینا بە پێوەن، تیرۆژ بە پەلە دێتە ژوورەوە، هەندێ ئەوراقی بەدەستەوەیە))

تیرۆژ: ئێستا ئەتوانن بڕۆن، ئیشم بە سەرەوە نەما.

گێلاس: باشە ماڵەکەم، هەرچییەکیش بوو زەنگم بۆ بکە.

تیرۆژ: بەسەرچاو.

(( چوونە دەرەوەی نیناو گێلاس و خواحافیزیی.. تیرۆژ سەرقاڵی داخڵکردنی قائمەکە ئەبێ بۆ کۆمپیوتەر، لە پڕێکا خەیاڵ ئەیباتەوە))

<u>تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:

بۆ نا؟ سوپرایز بۆ ئێستا باشە، ئەو چاوەڕوانی هەفتەو دوو هەفتەیتر ئەکا تێلی بۆ بکەم، هههه ئەگەر ئێستا بیکەم، هەر تێک ئەچێ هههه ئا ئا با بزانێ گرنگیشی پێ ئەدەم، خۆ خراپیش نییە و ئەمیش باشی هەیە، لەو خدرە ئەحمەقەش باشترە، هەر سەدقاتیش.

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>:

تیرۆژ (( تێل ئەکا)): ها قوربان.. باشیت هاوڕێ؟

ڕاماڵ(( دەنگ)): واو چەند باشم کە قسە لەگەڵ تۆیا ئەکەم، باوەڕ ناکەی چەند دڵخۆشت کردم.

تیرۆژ: سوپرایز بوو؟

ڕاماڵ: بەڕاستیی جوانترین سوپرایز بوو.

تیرۆژ: دوو سێ دەقەیەک کاتم هەبوو، وتم وەک ناتوانم بتبینم، هەر هیچ نەبێ هەواڵێکت بپرسم.

ڕامالْ: زۆر سوپاس بۆ هەوالْپرسینت، بەڕاستیی ئەگەر من بۆم هەبووایە زەنگت بۆ بکەم، ڕۆژانە دەجار هەوالْم ئەپرسیت.

تیرۆژ(( دەست ئەگرێ بەدەمییەو پێکەنین)): باش بوو بۆت نەبوو، ئەگینا هەموو ڕۆژێ چینێ تێهەلْدانی باشم ئەخوارد بەهۆی تۆوە.

ڕامالْ: جا من چۆن دلْم دێت تۆ بە لێدان بگەیەنم؟

تیرۆژ: سوپاس ئێستا گێلاس خان دێتە خوارەوە لە ئوتێلەکەیە، ببورە با مۆبایلم بە دەستەوە نەبینێ.

ڕامالْ: ئەی کەی ئەتوانم بتبینم؟

تیرۆژ: هەولْ ئەدەم، جارێ نازانم چۆن دەرفەت دروست ئەبێ.

ڕامالْ: تکایە منت بیر بێ.

تیرۆژ: ئەی ئەوە نییە هەوالْت ئەپرسم؟

ڕامالْ: سوپاس سوپاس بەقوربان، دە دایخە با نەیەتەوە، حەز ناکەم تووشی ڕووگیریی بیت.

تیرۆژ: سوپاس هاوڕێ، کاتی خۆش.

ڕامالْ: خوات لەگەلْ بەساقەوبم.

(( تیرۆژ مۆبایلەکە دائەنێتەوەو ئەگەڕێتەوە سەر ئیشەکەی))

Cut

دیمەنی – ٩٢٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن و خدر))

خدر(( خەندە)): هەر زۆر زۆر بوو.

نارەوەن: دڵنیابە فێڵم لێ نەکردوویت و زیادم بۆ دانەناوی هههە.

خدر: بە ڕاست چۆن وا بوو؟

نارەوەن: ئیتر ئەم یەک دوو مانگە بەرەو پایزو بارین ئەچین، خەڵک وردە وردە دانراو ئەخا، مانگی داهاتوو زۆر باشتر ئەبێ.

(( تریفە دێتە ژوورەوە، خدر لەبەری هەڵئەسێ.. دوای سڵاو))

نارەوەن: ئەوە خێرە تریفەماڵت چۆڵ کردووە؟

تریفە: بۆلای ئەم پیاوە هاتووم بۆ پرسیارێک، ئەمەوێ دڵنیامکا، کە بەهەڵەدا نەچووم.

خدر: لە خزمەتدام تریفە خان، فەرموو!

تریفە: ئەو پیاوەی ڕزگاری کردم لە قاوەخانەکە، زۆر شێوەی تۆی تیابوو، بە تایبەت دوێنێ شەو کە بە بۆینباغەوە بینیمیت.

نارەوەن(( پێکەنینی بە کوڵ)): تازە بیرت کەوتۆتەوە؟

خدر: نا تریفە خان، دڵنیات ئەکەمەوە من نەبووم.

تریفە: بەڵام من زۆر سەرنجم دایە تا دواتر بیناسمەوە، سەکسوک و قژێک دابنێی، ڕێک ئەویت.

نارەوەن: کچم بەهەڵەیا نەچووی، بەڵێ حەمە خدر گیان بوو، ئەی ناڵێی دایکم بۆ قەت خاتری ناشکێنێ؟

تریفە(( تاسان)): ڕاستە کاک حەمە خدر؟

خدر(( سەردائەخا )): بەڵێ.

نارەوەن: ئای کچەکەم باوەڕ بە دایکی ناکا، ئەیەوێ لە زاری خۆتەوە بیبیستێ!

تریفە(( هەڵئەسێتە سەرپێ و تەوقەی لەگەڵ ئەکا، بە منەتبارییەوە)): کەواتە بە ژیانم قەرزاری خۆتت کردم.. ئای خوایە چەند گەورەیت.. بەس چۆن پێتزانی و ئەو بیرۆکە جەهەنەمییەت چۆن داڕشت؟

خدر: ئەوە تێپەڕی تریفە خان، نە خۆت بە قەرزارم بزانەو نە دوای چیرۆکەکەشی بکەوە، شتێک بوو تێپەڕی و گرنگ ئەوەیە سەلامەت دەرچووی.

تریفە: تەبعەن بە هۆی تۆوە، ئەگینا ئێستا دەمێک بوو لە گۆڕا بووم.. هەر کاتێ بێ تۆڵەی ئەو چاکەیەت بۆ ئەکەمەوە دڵنیابە، ئەوە شتێک نییە بە ژیانم بیرم بچێتەوە (( دووبارە تەوقەی لەگەڵ ئەکاتەوەو ئەیەوێ دەستی ماچ بکا، خدر ناهێڵێ)) تکایە.

خدر: تۆ تکایە.. ئەوە چییە تریفە خان؟ وتم تێپەڕیی و تەواو، ڕازیم نییە جارێکیتر دووبارە بێتەوە.

تریفە: سوپاس بۆ بوونت، نازانم چۆن هەستی منەتباریی خۆم دەربڕم.

نارەوەن: بەسیەتی بیبڕەوە، کابرا پێی ناخۆشە لەسەری بڕۆی.

تریفە(( خەندە)): ئەی تۆ بۆ قسەت نەئەکرد خائین؟

نارەوەن(( خەندە)): کاتی نەهاتبوو.

(( دیالۆگ و پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ٩٢٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( ڕەمزی لەسەر نەخشەیەک ئاماژەی هەندێ هێڵ بۆ نیگار ئەکا ))

ڕەمزی: ئەمەش دەرگای سکەیە، ئیشەکە زۆر گەورەیە نیگارخان، خۆ ئامادەکردنی باشی ئەوێ.

نیگار: پارەکەی هەر وەک ئیشەکانیتر کە تەواو بووین؟

ڕەمزی: نا نیگارخان، وەک ئیشەکەی ڕێگاوبانە، ئەم تەندەرەش هەر حکومییەو بە پێشینە وەریئەگرین.

نیگار: ئۆو ببورە خەیاڵی ئەوەم نەبوو حکومییە.

ڕەمزی: ئەزانم ئەم ماوەیە لەسەرخۆت نیت، خەمت نەبێ ئیش ئەڕوا، تۆ سەرقاڵی خۆت بە.

نیگار: خۆت سەرپەرشتی بکەی باشتر ئەبێ.

ڕەمزی: شەنیاش زۆر باشە، ئێستا تێ ئەگا ئیش چۆنە.

شەنیا(( دێتە ژوورەوە)): بەسەر ناوی خۆما هاتم، ئادەی بزانم زەمی چیتان ئەکردم؟ هههه

(( پێکەنینی نیگار))

Cut

دیمەنی – ٩٢٥ – ڕ/ د – سەر شەقام:

(( زوبێرو ئامۆ بە دوای ڕێژوانەوەن کە بە پێ ئەڕوات.. بەدەم چاودێریی و سووک ڕۆشتنەوە))

زوبێر: لە نەخۆش ناچێ و ئەوەش ڕێی خەستەخانە نییە.

ئامۆ: نا هەڵپەی شوێنێکیەتی، ئیتر وا بە دوایەوەین تا ئەگاتە شوێنی خۆی.

(( ڕێژوان بەرەو دوکانی گەصێک ئەچێت، زوبێر ترس و سەرنجی ورد))

زوبێر(( هەر لە سەیارەکەوە، دانابەزن)): ئادەی بوەستە...(( پاش کەمێک)) ئەوە چی ئەکا ئەوماڵباب وێرانە؟!!

زوبێر (( تۆقین)): ئەوە ئەو کچە نییە ئەو شەوە لەگەڵ ئێوەیا بوو؟

ئامۆ: بەڵێ دڵنیایە.

زوبێر: کەواتە پیاوە هەڵخەڵەتێنراوە خێزاندارەکە، کوڕەکەی من دەرچووو؟!

ئامۆ: بەداخەوە.. ئەبێ زوو وریا بکرێتەوە.

زوبێر: بگەڕێوە.. ئێستا هیچ ناکرێ، خۆم چارەسەری ئەکەم!

ئامۆ: سەرچاو.

(( ڕۆشتنەوەی زوبێرو ئامۆ، بە سەیارەکەی ئامۆ))

Cut

دیمەنی – ٩٢٦ – ڕ/ د – شوێنێکی کارگەکەی ڕاماڵ:

(( ڕامالٚ و سەرچلٚ پیاسە ئەکەن، بەدەم پیاسەوە))

ڕامالٚ: ئەم زۆریش لە شەنیا باشترە.. ئەم بەیانییەش تێلم بۆ کردو پێموت جارێکیتر وەڕست ناکەم هەرچی لە منەوە ڕوویداوە لە ڕابردوودا داوای لێبوردن ئەکەم.

سەرچلٚ: ئەی ئەو هەموو پارەیەی خستتە بەردەستی؟

ڕامالٚ: ڕاستە پارەکە زۆرە، بەلاٚم من وەک باجی گەوجێتیی و بەرچاو تاریکیی خۆمم داناوە، وامئەزانی کچ بڕاوە لە دنیادا هاوسەرگیریی لەگەلٚ بکەم و بە دلٚی خۆم بێ، شەنیا نەبێ.

سەرچلٚ: ئەوە بەس بە بینینی تیرۆژ؟!

ڕامالٚ: ئا سەرچلٚ ئەو بینینە کەم نەبوو، بەڕاستی داخورپام، هەر ئەو ساتە تێگەیشتم شەنیا چاوبەستی کردبووم، هەموو دنیای لە خۆیا کۆکردبۆوە.

سەرچلٚ: ئەی پێی ناخۆش نەبوو ئەوەت پێوت.

ڕامالٚ: وا دەرئەکەوت ئەو بە جیهانی خۆیەوە خەریک بێت، هیچ بایەخی نەبوو بۆ قسەکانم، ڕەنگە وایزانیبێ هەروەکو جارانم، دەستخۆشییەکی ساردی کردو وتی ببوورە سەرقالٚم.

سەرچلٚ: ئەی ئەگەر تیرۆژ ڕازیی نەبوو؟ یان پەیوەندیتری هەبوو، یان چووزانم؟

ڕامالٚ: هەر زۆریش ئاساییە، تازە یەکجار تێکشکام و جارێکیتر ئەوە دووبارە نابێتەوە، بەشێکی زۆری ژیانی بەخەساردام، ئیتر نە شەنیاو نەکەسێکیتر شایانی ئەو خۆشەویستییەی من نیین، هاوسەرگیریش بکەم لەگەلٚ هەر کەسێکا، ناتوانم ئەو هەموو خۆشویستنە بدەم بە هیچ کەسێک.

سەرچلٚ: ڕامالٚ بە ڕاستی بلێٚم شایانی ئەو غەدرەی شەنیا نەبووی، بەداخەوە.

ڕامالْ: ئەوە تەواو، بەوهیوایەی ئەم باش بێتە پێشەوە، تا مانگێکیتریش چاوەڕێی ئەکەم بە گەرمیی، گەر نەهات، هیچ پەلەم لە کەس نییە.. ئەی تۆ چیت کرد؟

سەرچڵ: نازانم، ڕەنگە قسەکانی دەوران کاری تێ نەکردبێ، ئەڵێ هەفتەیەکیتر وەڵامت ئەدەمەوە، بە ڕازیی بوونم یان ناڕازیی بوون.

ڕامالْ: ئای لە دڵنیا مشکە، من وامئەزانی داماوە، کەچی زۆری لەژێر سەرایە.

سەرچڵ: شەش مانگێک ئەبێ هەر لە مەسنجەرەوە، جاروبار هیوایەکم ئەداتێ و کەمێ گەرم دێتە پێشەوە، جاری واش هەیە، ئەزانم لە خەتەو هەرچی بۆ ئەنێرم وەڵام ناداتەوە، کورە خەریکە ڕوحم دەربێنێ.

ڕامالْ: هەروەکو من لە خۆت نەکەی باشە.. زۆر خۆتی بۆ مەکوژە، هاکەزایی وەریگرە تا وەک پیاو تەماشات ئەکا.

سەرچڵ: دوای قسەکانی دەوران وام لێهاتووە، هەست ئەکەم غەریبە کەوتە نێوانمانەوەو هەرچییەک دروست ببێ کاریگەریی خەڵکە(( ئەکێشێ بە سنگیا)) بەڵام ئاخ!!! چی لە دڵ ئەکەی؟ کە هەر ئەیەوێ.

(( هاتن و چوون))

Cut

دیمەنی – ٩٢٧ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( ڕەمزی و شەنیا بە پێوەو گوڵزاری تەمەن ٣٠- ٣٥ ساڵ ئەنیق دانیشتووە))

شەنیا: کاک ڕەمزی ئەوەندە بە شیرینیی باسی کردوویت، خواخوام بوو بتبینم.

گوڵزار: سوپاس شەنیا گیان، تۆیشی هەر بە شیرینیی بۆ باسکردووم، منیش هەر تاسوقی بینینت بووم.

ڕەمزی: دەی بەو بۆنە جوانەی یەکتر ناسینتانەوە دەعوەتێکمان بکەن.

شەنیا: خوا ئەکا تۆ بە نانی ئێمە ڕازیی ئەبیت، ئەم ئێوارەیە ئەچینە دەرەوە.

ڕەمزی: ئەزانم گوێی نادەیتێ، وەک ئەوە وایە خواردبێتم، زۆر سوپاس.. خۆتان بچن.

گوڵزار: نا ڕەمزی حەز ئەکەم تۆش بێیت، بێ تۆ بە گەرووماندا ناچێتە خوارەوە.

ڕەمزی: ئێوە بچنە شوێنێک و شوێن و کاتەکەیم بدەنێ، هەر یەک تۆسقاڵ دەرفەتم بۆ هەڵکەوێ، منیش دێم. (( شەنیا پێی سەیر ئەبێ خۆیان ڕێک ئەکەون، ئەم تەنها موجامەلەی کرد))

گوڵزار: دەی باشە، ئەگەر شەنیا گیان لاریی نەبێت، کە دەوامی تەواو بوو دێم بە شوێنیا.. وتت چی گوڵەگیان؟

شەنیا: ڕەنگە ئەو کاتە کەمێک سەرقاڵ بم، ئەگەر ببوری.. بەڵام ژمارەکەم بدەرێ، پەیوەندیمان ئەبێت.

ڕەمزی: نازونوز مەکە کچەکەی میرنیزام، بڵێ باش و تەواو، یان کە زانیت هەردووکمان ملمان لە موو باریکترە، ترسای؟

شەنیا: نا لە خزمەتدام کاک ڕەمزی، جگە لە بۆنەی یەکتر ناسینی من و گوڵزار، بۆنەی گرنگتر ئەوەیە لەوەتای ئەتناسم ئەوەندە کراوەو دڵخۆش نەبووی.

ڕەمزی: جا تۆ چەند دەربارەی من ئەزانی؟ هیچ.. من بۆ هەر دانیشتنێک بایەخی تایبەتیم هەیە، خۆ ئەمە ئیش نییە تا تەنها وردەکاریی و جددیات بێ؟

شەنیا: واو.. دەی ئێوارە بتبینینەوە.. با نیگار خانیش بێت، ئەڵێی چی کاک ڕەمزی؟

ڕەمزی: دانیشتنەکە گەنجانەیە با پیرو پەککەوتەی تێ نەکەوێ ها ها ها.

شەنیا: نەبەخوا نیگار خان هەمیشە بەهارە.

گوڵزار: با جارێ ئێمە ئاهەنگێ بگێڕین، بوار زۆرە ئەو ژنەش بەشدار بکەین.

ڕەمزی: کەواتە من ئەڕۆم، وا ئەکەم ئێوارە بتانبینمەوە.

گوڵزار: منیش هەر ئەڕۆم.. تا ئێوارە... بای.

(( چوونە دەرەوەی ڕەمزی و گوڵزار))

Cut

دیمەنی – ٩٢٨ – ڕ/ د – ساحەی ناو نەخۆشخانە:

(( ساحەکە بە جۆرێکە ئەڕوانێ بەسەر دەرگای دەرەوەدا.. زوبێر هەردوو دەستی خستۆتە پشتیی و پیاسە ئەکا.. پاش کەمێک ڕێژوان دێتەوە ))

زوبێر: ئا وەرە گوڵی باوەی.

ڕێژوان (( دێت بۆلای)): ئەمرکە باوەگیان!

زوبێر(( شادو استغراب)): ئەوە کوڕی باوکی لە کوێ بوو؟ بێ ئەوەی بە باوکی بڵێ!!!!

ڕێژوان: کەمێک نەساغ بووم تا خەستەخانە چووم.

زوبێر: خێر چیتە باوانم؟

ڕێژوان: هیچ نەبوو کەمێک سەرم ئەیەشا، ئێستا باشم.

زوبێر: کوڕم سەرێشە نیشانەی نەخۆشییە چۆن بە من ناڵێی؟ ئەی چی پێوتی دکتۆر؟ چی بۆ نوسیت، ئادەی، من سەرەتەقەیەکم لەگەڵ داو و دەرمان هەیە.

ڕێژوان: خۆت نیگەران مەکە باوە گیان، هیچم نییە، ئەویش وتی ماندوویێتییەو ئەبێ پشوو بدەی.. هیچی بۆ نەنوسیم.

زوبێر: باشە لەمەودوا بۆ نەخۆشیش ویستت بچیتە دەرەوە، با بزانم.. ڕاستە ماندوویت، ئەوە پێخەفێکم هێناوە بۆ نوستن.. ئێستا بچۆ بنو، تا ئێوارەو کە ڕۆشتینەوە هەڵتئەسێنم.. ئەگەر باش نەبووی، ڕۆژانە بچۆ لەو جێیەی منا ڕاکشێ، باشە کوڕم.

ڕێژوان: ئەی بۆ لەماڵەوە پشوو نەدەم؟

زوبێر: یەکەم لەبەر من، با خەڵک بزانن کوڕەکەم پشتگیرمەو دووەمیش با لەگەڵ ئەو ژنەش دەنگەدەنگتان بۆ دروست نەبێ.. هەرچیموت، تۆ بڵێ باش و هیچیتر.

ڕێژوان: باشە بەسەرچاو. (( ئەڕوات)) ________________ Cut ________________

دیمەنی – ٩٢٩ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ئاوا:

(( ئاواو نینا، ئاوا شۆفێره))

ئاوا: بەرز یانزم؟

نینا: بەرزەکەی جوانتره.. بەس با جارێ مۆڵەتەکه دەرکەم!

ئاوا: هەر زۆر باشه ئەم ماوەیەش پێیەوه مەشغوڵ ئەبی، تا خانووەکه یەکلا ئەبێتەوه.

نینا: خۆت ئەو گەڕەکەت بەدڵە؟

ئاوا: خراپ نییه هێمنه.

نینا: نزیکی ماڵی خۆتان بووایه دڵگیرتره.

ئاوا: باشه.. بەسەرچاو، ئەوه هەڵئەوەشێنمەوه.

نینا: ئاخر زۆر لەسەرت نەکەوێ!!

ئاوا: ئەوه کێشه نییه، گرنگ ئەوەیه خانوو بۆ تۆیەو بە دڵی خۆت بێ.

نینا: لە هەر شوێنێک تۆی لێ بیت، ئەوه بە دڵی منه..

ئاوا: کچێ وەی قوربانت نینا گیان.. ئەوه قسەی من بۆ ئەدزی؟ ئەوه قسەی من بوو هی تۆ نییه.

نینا: هەه ئەی قسه گرنگتره یا دڵ؟ تۆ دڵی منت دزیوەو قسەش ناکەم، بەڵام مادام بۆ قسەیەک وا ئەکەی، شەرتبێ بە دایکت بڵێم.

ئاوا: جا منیش بە پورت ئەڵێم، هەی لەوه؟ وا ئەزانی کەس نییه سکاتی تۆی لا بکەم؟

نینا: پورم خاتری تۆی زۆر ناوێ با بزانی.

ئاوا: ئەوه قسەی جزدانەکەی خۆته.

نینا: نەبەخوا ئەمەیان سوعبەت نییە.. پورم هەموو شتێکیماڵی ئێوەی بۆ گێڕامەوە، باوەڕ ئەکەی کە باسی فڕاندنی تریفەو تەقە لێکردنی دایکتی کرد، هەر تۆقیم.. ئیتر ئەو عاجزییەی نێوانمان ئەوە بوو زۆر خراپ ترساندمی.

ئاوا: یەعنی پورە گێلاس ویستی لە یەکمان دوورخاتەوە؟

نینا: من وا تێگەیشتم.

ئاوا: یەعنی ئێستا ئەوەندە منت خۆش ئەوێ، نهێنی پوریشتم لا باس ئەکەی؟

نینا(( ئەکێشێ بە باڵیاو نازو خەندە)): ئەی خۆ نەمدۆزیویتەوە هەتیو؟! تۆ یەکەم پیاوی لە ژیانما خۆشم ویستبێ.

ئاوا: واو، گەیشتوومەتە کوێ و بەخۆم نەزانیوە؟ من وامئەزانی هەر من سوتاوی تۆم.. بەڵام ئەوەی پورت پێی وتی نینا گیان، خۆم ڕامسپارد هەموو شتێکی ماڵی ئێمەت پێ بڵێ و خۆشم یەک بە یەک شتەکانم پێوت، پێم باش بوو پێش هاوسەرگیریی، هەموو شتێک دەربارەی من و خێزانەکەم بزانی.

نینا(( هەردوو دەستی ئەگرێ بە دەم و چاویەوە)): واوووووو!

Cut

دیمەنی – ٩٣٠ – ئێوارەی درەنگ/ چێشتخانە:

(( شەنیاو گوڵزار))

گوڵزار: بەڵێ ئەوە هەمووی بە بێ ئاگاداری تۆ کراوە.

شەنیا(( ناوچەوانی ئەگرێ)): ئەی هاوار جا ئەوە باوکە یا دوژمنی قەسدی سەر؟

گوڵزار: هێمن بەرەوە شەنیا، با نەکەوینە بەر سەرنجی خەڵکی، بە تایبەت تۆ، وائەزانم لەژێر چاودێریدا بیت بە هۆی باوکتەوە.. ئێمە ئەم ماوەیە بۆیە لێگەڕاین تا ئەگەر چاودێریشت لەسەر بێ، کپ ببێتەوەو ئەوسا بێینە لات.

شەنیا: توشی شۆک بووم باوەڕ بکە.

گوڵزار: ئێمە پارەی هیچ ئیشێکی باوکتمان بەسەریەکەوە نەئەدایە، کەمێک دەمشڕو خۆدەرخەر بوو، ئیتر تەبیعەتە، زۆرێک لە پارەکانی لای ئێمە ماوەتەوە.. ئەم ماوەیە کاک ڕەمزیی بە باشیی چاودێریی کردوویت و بۆمان دەرکەوت ئەتوانین هەموو پارەکانی بخەینەوە بەردەستی تۆ، بەڵام با ساڵێک بەسەر زیندانیی کردنی باوکتا تێپەڕێ، نابێ قەت خۆی بەوە بزانێ.

شەنیا: ئەی هاوار بۆ هیچ تێناگەم، من بەڕێکەوت چوومە لای نیگارخان و کاک ڕەمزیم ناسی، ئیتر پارەی چی و حاڵی چی؟..

گوڵزار: هیچ بە ڕێکەوت نەبوو، کاری تەواوت بۆ کرا تا بچیتە لای نیگارو کاک ڕەمزیش دەستی تیابوو.

شەنیا(( سەرسام)): جا بۆ ناڵێی نیگار خانیش لەگەڵ ئێوەیە؟

# (( ئەڵقەی چل و پێنج))

گوڵزار: نا نیگار بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، هەر لە سەردەمی کاک دارەوانەوە بەکار ئەهێنرێ.

(( ڕەمزی دێتە لایان و پاش سڵاو))

شەنیا: ئەوە چییە ئەیبیستم کاک ڕەمزی؟

ڕەمزی(( گرژ)): هەرچیت بیستووەو لەمەودواش ئەیبیستی، یەک پیتی ناچێتە دەرەوە تێگەیشتی شەنیا؟ ئەوەی ئەیبیستی ئیشی کەسە گەورەکانە.

شەنیا: نا من دڵنیام لەوەی ئێوە گروپی گەورەن و نهێنی لە خۆڕا نادەن بە هیچ کەسێک.. (( بزە)) ئەوە بە خۆم نەزانیبوو چاودێریشت کردووم؟

ڕەمزی: ئەی خۆ بەبێ هەڵسەنگاندنیش ئیشی گەورەت پێ ڕاناسپێرین؟

شەنیا: مانای وایە ئێوە بۆ ئیشکردن لە گروپێکی پڕ مەترسیی بانگتان کردووم؟

ڕەمزی: هیچ مەترسییەکی تیا نییە گەر وەک من و گوڵزار بە وریاییەوە ئیش بکەی.. ئەوانیتر خۆدەرخەرو نەزان بوون بە هەردوو گروپەکەوە، جگە لە کاک دارەوان کە شوێنەکەی ئاشکرا بوو بە هۆی هەڵەو دان بە خۆدا نەگرتنی ڕێشارەوە.

شەنیا: بەڵام من ناتوانم هیچ جۆرە ئیشێکی مەترسیدار بکەم.. دڵنیاشم ئەمکوژن یان ئازارم ئەدەن، بەڵام ئەوە ناکەم کە خراپ بێ بۆ خەڵک و بۆ ژیانی خۆم.. من باوکم نییم باش بزانن.. دڵنیابن نهێنیتان لای من بەهیچ جۆرێک نابیسترێ و هیچ کارێکی دزی و کوشتن و تلیاکیش ناکەم.

ڕەمزی: بەڵێ ئێمەش نامانەوێ هیچ یەک لەو کارانە بکەی.

شەنیا: ئەی کەواتە من چ سودێکم هەیە بۆ ئێوە؟

ڕەمزی: ئێمە بۆ کارێکی خێر تۆمان دیاریکردووە، چاودێریمان کردوویت زیاتر لەوەی لە خەیاڵتایە، بەو پارەیەشەوە، کە لە ڕاماڵت وەرگرت و بردت بە ئامۆو دای بە باوکت.

شەنیا: با ئامۆ دوور بێت لەم باسانەوە.

گوڵزار: ئامۆ کوڕی کاک دارەوانەو هەموو خێزانەکەشی ئێمە لە پاراستنیان بەرپرسیارین، هیچ خەمی ئەوت نەبێ.

ڕەمزی: ئیشی تۆ تەنها پاراستنی ئامۆو دڵخۆشکردنیەتی، ئەوان ئامانەتن لەسەر ئەم گروپە گەر یەک کەسیشمان مابێت.

شەنیا: من چۆن ئەوە بکەم؟

گوڵزار: ئاسانە، تەنها بە هاوسەرگیریی کردنت لەگەڵیا.

ڕەمزی: دوای ئەوە هەستی بە هەر مەترسییەک کرد، لای تۆ باسی ئەکاو تۆش بە ئێمە ئەڵێی تا لە گێرەوکێشە بیپارێزین.

شەنیا: ئەگەر هەر ئەوە بێ لاریم نییە، بەڵام ئێستا ئامۆ زۆر ساردە لەگەڵ منا.. وەک چۆن ئیشتان بۆ کردم بمبەنە لای نیگار خان، ئاواش دڵی ئامۆ چاکبکەنەوە.

ڕەمزی: هاوکاریی تۆشمان ئەوێت.. لە ئێستادا گروپەکە زۆر لاوازەو بە دووجار زوربەی ئەندامەکانی گیراون، ئێمە هەوڵ ئەدەین لە زووترین کاتدا کەسێکی کاریگەر بۆ ئامۆ بدۆزینەوەو وای لێ بکا خۆی بگەڕێتەوە بۆلات.

شەنیا: ئامۆ قسەی کەس ناچێ بە گوێیا.. ئەی ئەوانیتر؟ چۆن ئەیانپارێزن، کە کەم بوونەتەوە؟!

ڕەمزی: کەسێکی هاوڕێی ئاوامان ناردووەتە لای خۆی و ئەو ئەیپارێزێ، ئەوانیتریش چارەسەر ئەکەین.. لە هەوڵی ڕاکێشانی کابرایەکاین ناوی حەمە خدرە.. بەو هەموویان پارێزراو ئەبن.

(( لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ٩٣١ – ش/ ن – چێشتخانە:

(( زوبێرو نیگارو دەوران لە پێش نانخواردن، تا نان دێت))

زوبێر: دیارە کچەکە زۆر وریاو زیرەکە، ئەگینا ئەو شەوە بینیم ئەوەندە سەرنجڕاکێشیش نییە.

نیگار: ئەی کوڕەکەی تۆ زۆر چاوبگێڕ نییە؟

زوبێر: نا نا نیگار، خۆت ئەزانی ژن وریایەو چاوی تیژە بۆ مێرد، وەک چاوی خاوەن تەعزێ وایە، ئەزانێ کێ هاتووەو کێ نەهاتووە، هەهە .. دەی ئەو سورە لەسەر ئەوەی کە خۆی هەڵەیەکی کردووە نەک مێردەکەی پەیوەندیتری هەبێت.

دەوران(( بە وردیی گوێی گرتووە)): ئێستا تەلەفونی بۆ ئەکەم بێت و ئەیبەمە دەرەوە، خۆم ئەزانم چۆن وایلێئەکەم، هەر بەیانیی هەموو شتێک هەڵوەشێنێتەوە لەگەڵ کوڕەکەتا.

زوبێر: دەی بەساقەی کچ بم.. چۆن دڵنیای ئەتوانی ئەوە بکەی؟

دەوران: ئەی ئاگادارم لەگەڵ کوڕێکیتر ڕێککەوتوون بۆ هاوسەرگیریی، ناوی سەرچڵە، هەڕەشەی ئەوەی لێ ئەکەم گەر لە کوڕەکەت نەکشێتەوە، هەموو شتێک بە سەرچڵ ئەڵێم.

زوبێر: ئای چەند داناو زیرەکیت دەوران گیان، من کەسی وریام زۆر خۆش ئەوێ، قوربانت.

دەوران: خوا نەکات مامە... کاک زوب.... ئەرێ بەڕاست من ئیتر بە تۆ بڵێم چی؟

زوبێر: پێم بڵێ باوە، باوکە، من ئەوەم پێ خۆشەو خۆشت برپیاربە.

دەوران: هەر زۆر خۆشە، من باوکی خۆم نەبینیوە، زۆر سوپاس دوای ئەو هەموو ساڵەی تەمەنم، ئەتوانی باوکم بیت.

نیگار: نا نا سوپاسی ناوێ دەوران، ئیتر ئێمە خێزانێکین و من دایک و ئەو باوکت.

دەوران: دە توخوا تۆزێ زوو ئەو ڕۆتینە تەواوکەن، با ئیتر لە ماڵێکا بین.. خۆ کوڕو کچەکانی خۆت تێگەیاندووە؟

زوبێر(( پێکەنین)): ئەوانیش وەک تۆ پەلەیانە.

دەوران(( دەست بەرز ئەکاتەوە)): واو خوشک و براشم ئەبێت، ئای کە خۆشە.. " مەم، ئەم ڤێری هەپیMam im very happy".. با تەلەفونەکە بکەم.

(( دەوران تێل ئەکات و ئەوانیش پێکەنین و دڵخۆشیی))

Cut

دیمەنی – ٩٣٢ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن دێتە ژوورەوەو تیرۆژ لەسەر قەنەفەیەک خەریکی مۆبایلە))

تیرۆژ: دایکە بەیانی کەژاڵ و هاوسۆزی هاوڕێم دێن بۆ ئۆفیس و لەوێوە ئەچینە دەرەوە.

نارەوەن: باشە زوو بێیتەوە.

تیرۆژ: زووی چی؟ لەکەیەوە نەمدیون؟ وەڵا ڕەنگە ئێوارەش پێکەوەبین بۆ نانخواردن!

نارەوەن: ئەوەیان بە کاکە ئامۆت بڵێ، ماوەکە زۆرە، من هەقم نییە.

تیرۆژ: دە توخوا خۆت پێی بڵێ و ئیزنم بۆ وەرگرە، دەی بەساقەوبم.. دەی توخوا.

نارەوەن: دەباشە مێشکم مەبە، زۆر ئەملاولا نەکەی.

تیرۆژ: نەبەخوا هەر لەگەڵ ئەوانا ئەبم.

نارەوەن: دەی باشە برۆ، ئەڵێم خۆم ئیزنمداوە.

تیرۆژ(( بە گەرمیی)): وەی قوربانی دایکە گیان بم.. زۆر سوپاس.

(( نارەوەن ئەچێتە ژوورێکەوەو تیرۆژ خەریکی مۆبایل ئەبێتەوە))

تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ٩٣٣ – متبوع - ش/د- باخی ماڵی نارەوەن:

(( تریفە بە تەوازوعەوە لەگەڵ حەمەخدر دانیشتووە))

تریفە: با حوکمەکەی دەربچێ جارێ.

خدر: ڕاستە ئەبێ چاوەڕوان بی، بزانی لە ٣ ساڵ کەمترە یان نا؟

تریفە: یەک سەعاتیش حوکم بدرێ من تەڵاقی خۆمی هەر لێوەرئەگرم، ئاخر کەس نەما دزیی لێ بکا، ژنەکەی خۆی نەبێت؟

خدر: تۆ ئەو پارەیەش وەرئەگریتەوە، بەڕاستی کابرایەکی سەیر بوو، ئێستا ئەبێ هەرچی دزیوە لە پارەکانی دەربکرێ، پشتیشی تەنها بە دزیی بەستبوو.

نارەوەن(( دێتەوەو کاغەزێکی پێیە)): ئەوەش تاپۆی خانوەکەی تریفە، بە ناوی خۆیەوە تۆمار کراوە.

خدر(( وەری ئەگرێ و سەیری ئەکات و ئەیداتەوە نارەوەن)): زۆر باشە نارە خان، تریفە هەم خانووەکەی و هەم تەواوی پارەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە، هیچ کێشەی نییە.

نارەوەن: خۆ من ناهێڵم لە هیچی کەم بێ، بەڵام خۆشترە سەرمایەکەی خۆشی بۆ بگەڕێتەوە.

تریفە: ئەوسا ئیشێکی وای پێوە ئەکەم، شەوەکە بتوانم بێمەوە ماڵەوە.

نارەوەن: خەمی ئیشت نەبێ کچی خۆم، جارێ خوا ئەکا دەستت لە دەستی ئەبێتەوە.

تریفە: من و هەڵشۆ مەحاڵە یەک بگرینەوە.

نارەوەن: ئەرێ حەمەخدر وەک بزانی ئەمیش هەروەک دارەوانی لێ بەسەردێت؟

خدر: هەموو کوژراوەکان بەسەر ئەما ساغ بوونەتەوە، باوەڕناکەم بە زیندانیی کردن ڕزگاری بێت، ئیتر ئەوەش ڕای دادگا خۆیەتی چۆن بڕیار ئەدا.

(( دایالۆگ لە میوتیدا)) ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٩٣٤ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا- ژووری ئاوا:

(( ئاوا دانیشتووەو بانگی ڕەوەز ئەکا، هێمن و سەرکزە))

ئاوا: ڕەوەز.. ڕەوەز!!

ڕەوەز (( دێتە ژوورەوە، زۆر شەرمن)): فەرموو گەورەم؟!

ئاوا: ئێستا حسابەکەی دوێنێم بۆ بێنە مجالم باشە.. خۆ هیچ ڕووینەدا؟

ڕەوەز: نا گەورەم.

ئاوا: دوای پاکتاو کردنەکەی، من ئەڕۆم ئیشم هەیە.

ڕەوەز: بەڵێ باشە.

ئاوا: ئەرێ کابرا تۆ لە مەکتەبا چەنەت زۆر ئەدا، کەچی ئێستا متقت لێوە نایەت.. جاری وا هەیە پێویستیم بە ڕوونکردنەوەی گرنگە، تا لێت نەپرسم هیچم دەست ناکەوێ، ئەبێ لەم کۆمپانیایە وانەبی، بەلانی کەمەوە لەگەڵ منا، وەک جاران بە جاران.

ڕەوەز: بەسەرچاو.

ئاوا: وابزانم لەگەڵ تۆیا دەری ناهێنێ، بڕۆ حسابەکە بێنە.

ڕەوەز: بەسەرچاو گەورەم. (( ئەیەوێ بڕوا ))

ئاوا: مەڕۆ.. ئاوەرە پێشەوە (( ڕەوەز دێت و ئاوا دەست و مەچەکی ئەگرێت و دەست لە سەرو ناوشانی ئەدات)) وتم نەک ڕۆبۆت بی با جوان دەستت تێوەبەم.

ڕەوەز: نا گەورەم ڕۆبۆت نیم.

ئاوا(( سوعبەت)): دەی یا من یا تۆ ڕەوەزەفەنی، بزانە ئەتهێنمە قسە یان نا؟

ڕەوەز: لە خزمەتتدام گەورەم.

ئاوا: ئەزانی لە مەکتەب کێشەی ئەوەمان لەگەڵتا هەبوو، زۆرت ئەوت؟

ڕەوەز: بەڵێ گەورەم ئەوسا پێتان ڕائەبواردم و گاڵتەتان پێ ئەکردم.

ئاوا: ئەها، مانای وایە لەبەرئەوەی گاڵتەت پێکراوە، بۆیە ئێستا وا کەمدوویت؟

ڕەوەز: ئیتر خووم بەوەوە گرتووە بەقەدەر پرسیار وەڵام بدەمەوە.

ئاوا: دەی لێرە کەس گاڵتەت پێ ناکاو من ڕێک وەک برای خۆت سەیرکە، ئەوە پارێزەرو ژمێریار و چایچییەکەش هەر براتن.

ڕەوەز: زۆر سوپاس. ڕاستە.

ئاوا: ئیتر ئەکرێیتەوە.

ڕەوەز: هەوڵ ئەدەم گەورەم.

ئاوا: باشە، بچۆ حسابەکە بێنە.. ئەوە چارەسەر ئەکەین.

(( ڕەوەز ئەڕوات و ئاوا لە دواوە دیقەتی ئەدا))

Cut

ديمەنی – ٩٣٥ – ڕ/ن – ژووری نوستن:

(( دڵنیا ڕاکشاوەو تێل ئەکا))

دڵنیا: ١- چۆنی؟ ....... ٢- من باش نیم.......... ٣- نا، خۆزگە نەخۆش بوومایە، بەڵام لەوە ناخۆشتر ئەوەیە کۆتایی بە نێوانی من و تۆ هات و باوکم بەزۆر ئەمدا بە ئامۆزایەکم، ئەم ژمارەیەش کە تەنها بۆ تۆم بەکارهێنا، لە ئێستاوە ئیتر ناکرێتەوەو هیچ هەوڵێکیش مەدە پەیوەندیم پێوە بکەی، بزانن هەردووکمان ئەکوژن....... ٤- کاکە گیان هیچ بەدەست من نییە، ئەم تێلەشم بۆیە بۆ کردی، تا نەڵێی کچەکە دەستی بڕیم.......... ٥- زۆر خراپ حاڵیی بوویت، من کچی هەڵگرتن نیم، مادام ئەوە قسەت بوو، شەرتە ئیتر بە خەیاڵیشما بێی نەفرەتت لێ بکەم.

(( مۆبایل دائەخاتەوەو سیم کارت دەرئەهێنێ))

Cut

ديمەنی – ٩٣٦ – ڕ/د - حەوشەی نەخۆشخانەکە:

(( ڕێژوان لە شوێنێکدا وەستاوەو تێل ئەکا))

ڕێژوان: ١- باشی گیانی من، دڵ و هەناسە؟ ....... ٢- بۆ گوڵە جوانەکەم؟ چی ڕوویداوە، خۆ خوانەخواست نەخۆش و سەرێش نیت؟ ......... ٣- ئەوە تۆ ئەڵێی چی بەرخەکەم، من وا ژنەکەم تەڵاق ئەدەم و لە خوتوخۆڕایی چی خوا پێی ناخۆش بێ لەگەڵیم کردووە، ئەوە کەی قسەیە تۆ ئەیکەی؟................. ٤- جا ئەوە دەستبڕین نەبێ چییە؟ من ماڵی خۆمم بۆ تۆ کاول کردووە بەقوربان، تکایە چارەسەرێک بدۆزینەوە، ئامادەم هەڵتگرم، چی ئەڵێی ئەوە ئەکەم ......... ٥- ئەلو ئەلو دڵنیا، دڵنیا؟!!!!!!!

ڕێژوان: ئای خوایە ئەمە چی بوو تۆ بڵێی بەڕاستی بێت (( پەیوەندیی ئەکا)) ئەوە خۆ تەواو، هەموو شتێک تەواو.. نا، بەخوا ڕەنگە تاقیم بکاتەوە، چۆن شتی وا ئەکا.. نا نا گاڵتە ئەکا، ئەو خۆی پێی وتم زۆرم خۆش ئەوێی، ڕەنگە هەر چەند سەعاتێک بێ، چاک ئەبێتەوە.. قەت شتی وا ناکا، نا نا هەرگیز!!

(( ئەچێتەوە بەرەو ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٣٧ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز بە پێوە، سەردار، مسیطر لەسەر کورسیی تەنیا .. ئاری و مفەوەز دانیشتوون ))

بەهێز: تۆ لە پرسەکەی شۆڕشا سارد دەرکەوتوویت و نەچووی بۆ پرسەی ڕۆڤانی کوڕیشی.. هاوڕێیەتیتان لەگەڵ شۆڕشا زۆر لەوە گەرمتر بوو تۆ یەکەم شینگێڕی بیت.

سەردار: بەڵێ، هاوڕێ بووین.. بەڵام تێکچووین.

بەهێز: لەسەر کچەکەی کە تۆ دڵت پێوەی بوو و ئەتزانی ئەو ڕازیی نابێ، ویستت دواتر بە ناچاریی شووت پێ بکا؟

سەردار: ئەگەر وابووایە ئەچووم بۆ پرسەی کوڕەکەی، خۆ خۆی لە ژیانا نەمابوو.

بەهێز: کەواتە هەر سزادانی شۆڕش بوو؟

سەردار: بە هیچ جۆرێک ئەوەم نەکردووە.

بەهێز(( سەرئەباتە لای سەریەوە )): ئەی شۆڕشت بۆ کوشت؟

سەردار: ئەوە تاوانبار کردنە، من نەمکوشتووە، فەرمانی میری گەورە بوو.

بەهێز: بۆچی بە جارێک بە ناوی زەکی و بەناوی میری گەورەشەوە دەرکەوتووی؟

سەردار: من تەنها بە ناوی زەکییەوە نامەم بۆ هەڵشۆ جێهێشتووەو هەرگیز بە ناوی میری گەورەوە قسەم نەکردووە، ئەیکوشتم شتی وام بکردایە.

بەهێز: جگە لە هەڵشۆو نەجات، چەندیتریان پەیوەندیان بە تۆوە هەبوو؟

سەردار: هەرچی میر خۆی پێی نەکردبێ، بە منی ئەوت پێی بکەم، لەو دووەش زیاتر کەسیترم نەناسیوە.

بەهێز: شۆڕش و ڕۆڤان لەسەر قسەی تۆ کوژراون و بە زەکی نامەت داوە بە هەڵشۆ.

سەردار: فەرمانی میری گەورە بوو.

بەهێز: بیربکەرەوە چ بەڵگەیەکی بچوکیشت لە خەیاڵا بێ بمانگەیەنێتە ئەو میرە، پێش ئەوەی خۆت ببیت بە قوربانیی بۆ میرەکەت.

سەردار: پێمخۆش ئەبوو هاوکاریتان بکەم.

بەهێز: گومانت بۆ هیچ کەسێک ناچێ؟

سەردار: وابزانم ئەم پرسیارەم دە جاریتر وەڵام داوەتەوە.

بەهێز: ئەوە ئیشی خۆمانە، تۆ تەنها وەڵام ئەدەیتەوەو هیچیتر.

سەردار: نەخێر.

بەهێز: پەیوەندیت چۆن بوو لەگەڵ کوڕەکانی دارەوان؟

سەردار: یەکێکیانم بینیوە، ئەویش بەهۆی شۆڕشەوە، وابزانم داوای کچەکەی ئەکرد.. هیچ جۆرە پەیوەندییەکم لەگەڵیانا نییە.

(( بەهێز ئەچێتەوە سەرمێزەکەی و زەنگ ئەکا پۆلیس دێتە ژوورەوەو تحیە و پێی ئەڵێ سەردار بباتە دەرەوە))

—————————— Cut ——————————

دیمەنی – ٩٣٨ – ڕ/ د – بەرئۆفیسی وەکالەت:

(( گوڵزار تایەی پێشەوەی لای سایەقی پەنچەرەو وەستاوە بە دیارییەوە، یەک دوو کەس ئەیانەوێ هاوکاریی بکەن، بە ڕەقیی بە سوپاس وەڵامیان ئەداتەوە، تا خدر بە چاکەت و پانتۆڵەوە دێت و سەیارەکەی لە پشتیەوە ئەوەستێنێت، خدر ئەیەوێت ڕاستەوخۆ بچێت بۆ ئۆفیس، گوڵزار ڕێی پێ ئەگرێت ))

گوڵزار: بە یارمەتیت هاوکارییم ناکەیت تایەم پەنچەرە؟

خدر(( بایەخی پێ نادات )): ئێستا یەکێکت بۆ ئەنێرم. (( ئەیەوێ بڕوا )).

گوڵزار: ئاخر من متمانەم بە هەموو کەسێک نییە، لێم نزیک بێتەوە.

خدر: ئەی متمانەی چیت بە من کرد؟

گوڵزار: بە جل و بەرگەکەتا دیارە پیاوێکی بەڕێزیت.

خدر(( پشتی تێ ئەکا بۆ ڕۆشتن )): بە جل و بەرگا تێمەکەوە.. مادام وایە باوکت یان برایەکتی بۆ بانگکە (( ئەڕوات ))

(( گوڵزار دووجار بانگی ئەکا کاکە، کاکە، خدر وەڵام ناداتەوە.. گوڵزار تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ٩٣٩ – ڕ/ د – قاوەخانەیەک:

(( تیرۆژو ڕامالّ دانیشتوون))

تیرۆژ(( دەستی بە دەمیەوە گرتووە پێئەکەنێ)): بە ڕاستی شایانی بەزەییت هههههە.

ڕامالّ: ئەی وایە گوڵم، کە کەسێک سادە دەربکەوێ و دڵی پیس نەبێ و هەر ڕۆژەی مەعشوقێکی نەبێ، شایانی بەزەییە.

تیرۆژ: ببورە، نەمویست ئازارت بدەم.

ڕامالّ: بەڵام ئازارتدام.

تیرۆژ: ببورە، ئەوەندەش دڵت ناسک نەبێ، ئەگینا کەس لەگەڵتا ئیدارە ناکا.

ڕامالّ: من وەک زۆر پەلەمە بۆ سەرگرتنی پرۆژەکانم، زۆریش پشووم درێژە، بەڵام بەرگەی هەندێ قسەش ناگرم، کزەیەک بەجەرگما دێت و بڕوات بێ خەریکە بگریم.. ئەگەر ئەوە دڵناسک بوون بێ، وایە، زۆر زۆر دڵناسکم.

تیرۆژ: دەی باشە ئەوە سێجار بڵێم ببورە ببورە، تەواو؟

ڕامالّ: تۆ ئەبوورم، تەنها تەنها تۆو تەنهاش ئەمجارە.. بەڵام تۆش قبوڵی سزایەکم بکە.

تیرۆژ(( پەست ئەبێ)): ئۆوهۆووو دە وامەکە چاوەڕوانی تۆڵەت بکەم، ئەوە خراپە.

ڕامالّ: نەموت تۆڵەت لێ ئەکەمەوە، وتم سزات ئەدەم، خراپ حاڵیی بوویت.

تیرۆژ: فەرموو بزانم سزاکەت چییە؟

ڕامالّ: ئێوارە پێکەوە نان بخۆین.

تیرۆژ: نازانم، با تێلێک بۆ دایکم بکەم، کێ ئەڵێ ئیزنم ئەدا؟ سزاکەت قورس بوو.

ڕامالّ: دە تەلەفونەکەت بکە با من دڵنیابم.

تیرۆژ: ئەریَ تۆ هەموو شتێکت پەلەیە، ئەوە چیتە؟ لەگەڵ منا ئەبێ بە تەحەمول بیت.

ڕاماڵ: ناتوانم.. ئەوەم لەگەڵ خەڵکیترا کردو دواتر هەر خۆت پێتوتم شایانی بەزەییت.

تیرۆژ: ئێییییی، نەبڕایەوە؟.. ئەچمە ژوورەوەو تێلیشی بۆ ئەکەم، تا دێمەوە دەرەوە صاف نەبووبیت، کە ڕۆشتم نامبینیتەوە.. (( هەڵئەسیَ و ئەڕوات))

ڕاماڵ: ئەگەر ئەمرە قبوڵە.

تیرۆژ(( کەمێک دەم بادان)): نا پاڕانەوەیە هههەه.

(( تیرۆژ ئەڕوات و ڕاماڵ خەندە، ئەم جلوبەرگەی هەردووکیان ڕاکوارە بۆ دیمەنێکی دواتر))

Cut

دیمەنی – ٩٤٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( ڕەمزی و شەنیا لەسەر قەنەفەیەک بە تەنیشتی یەکەوە دانیشتوون و دیراسەی نەخشەیەک ئەکەن، تەماشای نەخشەکە ئەکەن و شت ئەنوسن.. نیگار هەڵئەسێتە سەرپێ ))

نیگار: تەواو بوو دەوام تەواو، دیارە ئێوە نیازی هەستانتان نییە؟!

ڕەمزی: یەکتۆزی ماوە، ئەها ئەهـ.

نیگار: ئاخر من مەوعیدێکم هەیەو ئەبێ شەنیاش بگەیەنم، بیخەنە بەیانی، سێ ڕۆژتان بە دەستەوە ماوە.

شەنیا (( بۆ ڕەمزی )): بڕۆین؟

ڕەمزی: دە تۆ بڕۆ نیگار خان، من شەنیا ئەگەیەنم.

نیگار: وەڵا هەزارجاریش، دەی من بە دوعا. (( خواحافیزیی و ڕۆشتنی نیگار ))

شەنیا (( پاڵ ئەداتەوە )): ئێ!! هیچتان بۆ کردم؟

ڕەمزی (( گرژ )): با ئیشەکە تەواوکەین، قسەمان زۆرە، ئێستا کاتی ئیشە.

(( شەنیا سەر ئەهێنێتە پێشەوە، دەست ئەکەن بە نوسین و پاش کەمێک، نوسینەکان هەڵئەگرن و نەخشەکە دائەخەنەوە ))

ڕەمزی: ئەو هەتیوە سەرسەختە، بە ئافرەت ناگیرێ.

شەنیا: هەتیو کێیە؟

ڕەمزی: خدر.. ئەبێ خۆم شتێک بکەم، بەڵام نازانم چۆن؟

شەنیا: لەگەڵ نارەوەنیش زۆر ڕێکن.

ڕەمزی: ئەزانم، خدر لەگەڵ باوکیشتا ڕێک بوو، باوکت نەگیرایە، ئیشی تلیاکیشی پێ ئەکرد.

شەنیا: بەڵێ هەموو ئیشێک ئەزانن، بە نارەوەن ناکرێ ئەو کابرایە بگرین.. خۆ من ڕێێکم لەگەڵیا.

ڕەمزی: هەرچەند بەردەوام بەیەکەوەن و ئەڵێی ئاشقەوماشقەن، بەڵام نارەوەن بە تۆ ناگیرێ.

شەنیا: باااا زۆر زۆر باشە لەگەڵ من، داینابوو ببم بە بووکی.

ڕەمزی: تۆ نارەوەن بۆ هاوسەرگیریی خۆت بەکاربێنە، بەڵام جارێ نا، با ئێمەش کارێکمان کردبێتە سەر ئامۆ.. هەستە با بچینە دەرەوە، لە سەیارەکەیا قسەمان تەواو ئەکەین.

شەنیا (( دڵخۆش )): ئۆکەی!!!!

(( گڵۆپ ئەکوژێننەوەو ئەچنە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ٩٤١ – ڕ/ ئێوارە - قاوەخانەیەکی جیاواز:

(( سەرچڵ و دڵنیا پێکەوە دانیشتوون))

دڵنیا: کچ نییە کوران پێیان نەوتبێ و داوای خۆشەویستیان لێ نەکردبێ، بەڵام من نەمتوانیوە تا ئێستا کەسم خۆش بوێ.. باوەڕ بکە یەکەم کەسیشیت ئاوا لەگەڵتا لە شوێنێک بە تەنیا دانیشتبم.

سەرچڵ: دڵنیام دڵنیا گیان.. لە چاوتا ئەوە ئەخوێنمەوە، پڕە لە شەرم و ترس.. منیش زۆر وەڕست ناکەم، باوەڕ بکە زۆر دەمێکە تەمەننای ئەم ڕۆژە ئەکەم و هیوام بۆ خواستووە، ناهێڵم زۆر ببات و زوو دێمە داوات.

دڵنیا(( سەردائەخا)): باشە.

سەرچڵ: دە بەسە شەرم کردن ماڵەکەم، ئیتر من و تۆ هی یەکین، شەرم لە چی ئەکەی؟ دەی سەرت هەڵبڕە.

دڵنیا: بەدەست خۆم نییە، جارێ ناتوانم شەرم نەکەم، بمبورە.

سەرچڵ: کێشە نییە، ئای لەو ڕۆژەی زەڕڕە شەرم چییە ناتمێنێ و بە دڵی خۆمان تەماشای ناو چاوی یەکتری ئەکەین.

دڵنیا: خواکەریمە! نەڕۆین درەنگ بوو؟

سەرچڵ: باشە با تۆ دوانەکەوی، با بڕۆین.

(( هەڵئەسن بەرەو کاشێرو ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٩٤٢ – ئێوارەی درەنگ/ دەرەوە – بەردەمی چێشتخانەیەک:

(( تیرۆژو ڕامالْ لە سەیارەکەی ڕامالْ دائەبەزن و بەرەو چێشتخانەکە ئەچن.. لە ژوورەوە ئاواو نینا دانیشتوون.. تیرۆژ بە پەلە ئەگەڕێتەوە))

ڕامالْ(( حەپەساو)): ئەوە چی بوو؟

تیرۆژ(( ترس)): عاسمانەکە بگەڕێوە، ئەوە ئاوای برام و دەزگیرانەکەیەتی.

ڕامالْ: کوان لە کوێن؟

تیرۆژ(( بە ترسەوە)): جارێ تۆ پەلەکە، بادەرچین، لە ژوورەوەن لە ژوورەوە.

ڕامالْ: باشە ئەچین بۆ شوێنێکیتر (( بە پەلە سەر ئەکەوێت)

(( تیرۆژیش سەرئەکەوێت و بە پەلە ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ٩٤٣ – ش/ن – ماڵی ڕێژوان:

(( ڕێژوان خۆی دەرگا بە کلیل ئەکاتەوەو دێتە ژوورەوە.. ناوماڵ ئەگەڕێت و سەلوا نابینێ، چەند جارێک بانگی ئەکا، وەڵام نییە.. تێلی بۆ ئەکا ))

ڕیژوان: ئەوە لە کوێی؟

سەلوا (( دەنگ )): لە خەستەخانەین، چیمەن منالّی ئەبێ.

ڕێژوان: ئەی بۆ پێت نەوتووم؟

سەلوا: بۆچی تۆ قسەیەکم لەگەڵ ئەکەی تا من تەلەفونت بۆ بکەم؟

ڕیژوان: باشە، پێویست ئەکا من بێم؟ زۆر هیلاکم!

سەلوا: ئەگەر بێی باشترە، باوکت و کاک ئامۆش لە ژوورەکەی دانیشتوون.

ڕێژوان: ئەها!! بۆیە لە خەستەخانەکە ون بوون.. دەی باشە وا دێم.

(( مۆبایل دائەخاتەوەو ئەچێتەوە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ٩٤٤ – ش/ن – هۆڵی ماڵی ئاكۆ:

(( ئاكۆو گێلاس دانیشتوون، تیڤی هەڵكراوە))

ئاكۆ: وەڵا باوكم هەر ناكەونە ماڵ، ڕۆژ ڕۆژی ئەوانە هههە.

گێلاس: دەی هەر ئەم ماوەیەیان خۆشە، خۆت بیرنایەت بە تۆ بووایە نەكەوتینایەتە ماڵ؟

ئاكۆ: ئۆو، خۆشترین كات، ئێستا ئەوانیش وان گێلاس، گرنگ ئەوەیە دڵیان خۆش بێ و دواتریش لە یەك بحەسێنەوە.

گێلاس: ئینشائەڵڵا.. وا هەر ناشیەتەوە پێی بڵێم بەیانی بێت بۆ پۆلیس هههە.

ئاكۆ: نەتزانی بۆچی بانگكراون؟

گێلاس: نا، ئەو پۆلیسەی ئاگادارییەكە ئەهێنێ، ئیشی هەر ئاگادار كردنەوەیە، مامە حەمەو مامە یاسینیش بانگ كراون، تەلەفونیان بۆ كردم.

ئاكۆ: ئەگەر مەسەلە پارە وەرگرتنەوەی تۆ بووایە، من و دیار بانگ ئەكراین نەك ئەوان.

گێلاس: وایە، باوەڕ ناكەم بۆ ئەوە بێ، بەیانی هەموو شتێك تێ ئەگەین.

ئاكۆ: بەخوا دیاریش زۆر هیلاكە، خۆزگە كەسێكمان بخستایەتە شوێنەكەی.

گێلاس: ئۆو نازانی چەند حەزی لە ئیشەكەیە، هەر پێی بڵێم باوكت وا ئەڵێ، دێت بەگژما.

ئاكۆ: مادام دڵی پێی خۆشە، با جارێ ڕایكێشێ، من بیری ئەكەم بەیانی ئەچم بۆلای.

(( هەندێ دایالۆگ لە میوتیداو گێلاس هەڵئەسێ بۆ ژوورێكیتر))

Cut

دیمەنی – ٩٤٥ – ش/ د – ناو سەیارەی ڕامانڵ:

(( ڕامانڵ شۆفێرەو تیرۆژ، بە هەمان ڕاکواری دیمەنی ٩٤٢))

تیرۆژ: کەواتە دەرهێنانی مۆڵەتەکەم لەسەر تۆ؟!

ڕامانڵ: هەمووی لەسەر من، هەرچییەک تۆ پێویستت بێ.

تیرۆژ(( ئاماژە ئەکا )): زۆر سوپاس، لەم کۆڵانەوە.

ڕامانڵ: سەرچاو.

تیرۆژ: پێش ئەوەی بگەینە سووچەکەی ماڵی خۆمان ڕایگرە.

ڕامانڵ: خۆت پێم بڵێ.

تیرۆژ((ئاماژە)): پێش ئەو سەرسووچە بوەستە، ماڵی ئێمە لە کۆڵانەکەدایە، تا سەیارە نییە با دابەزم، سوپاس بۆ هەموو شتێک.

ڕامانڵ: ئەڵێم ئەی بۆ نەگەڕێینەوە شوێنەکەی خۆمان و بتهێنمەوە، با شارەزابم.

تیرۆژ(( پێکەنین )): ئەزانم بە دڵتە، نا کات درەنگە ئێستا دڵیان لە مستیانایە، بۆ کاتێکیتر بەقوربان.

ڕامانڵ: بەڵێنم بدەرێ زوو زوو یەک ئەبینین.

تیرۆژ: هەوڵ ئەدەم، دەی بای، لەوێیا ستاند بای نەبی وریابە هههە (( بە لەنجەوە ڕۆشتن و لە سوچەکە ون ئەبێت و ڕامانڵیش ئەڕوا ))

Cut

دیمەنی – ٩٤٦ – ش/د – ڕاڕەوی نەخۆشخانەیەکی ئەهلی:

(( زوبێرو ڕێژوان وەستاون))

زوبێر: ئامۆم ناردەوە بۆ ماڵەوە زۆر ماندوو بوو.

ڕێژوان: ئەی مناڵەکەیان بۆ نەهێنای؟

زوبێر: پەلەت نەبێ، ئێستا سەلوا ئەیهێنێ.

(( نیگارو دەوران بە هەڵەداوان دێنە لایان، سڵاو))

نیگار: ئەی بۆ زوو قسەت نەکرد؟ لە کوێیە؟ خۆ وەزعی خۆی باشە؟

زوبێر: خۆی زۆر باشە.. نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو بوو، لە ژووری خۆیەتی.

نیگار(( ئاماژەی یەکەم ژوور ئەکا)): ئەمەیە؟

زوبێر: بەڵێ بەڵێ خۆیەتی.

نیگار(( خەندە)): بووی بە باپیریش؟ هەهە.

زوبێر: بەڵام هەر گەنجم هەهەه.

(( بە پەلە نیگارو دەوران ئەچنە ژوورەکەوەو پاش کەمێک سەلوا مەلۆتکەیەک ئەهێنێ))

سەلوا(( بە زمانی مناڵ)): باپیرە باپیرە سەیرمکە، بزانە جوانم؟

زوبێر: واو چەند جوانە.

سەلوا: هەر ئەڵێی باوکیەتی توخوا وا نا؟

زوبێر(( پێکەنین)): ئادەی ئادەی..وای وای لە کێ ئەچێ لووتەکەی؟ لە باوکە نابووتەکەی.. بەڵام لە کێ ئەچێ ڕەوشتی؟ لە باپیری شیر لە پشتی هەهەه.

سەلوا(( بۆ ڕێژوان)): ئەی تۆ سەیری ناکەی؟

ڕێژوان: نا بینیومە، پێویست ناکا.

زوبێر: کچم دوێنێ شەو هاتە خەوی و بینی ڕاست ئەکا.

(( سەلوا بە پەلە مەلۆتکەکە ئەباتەوە بەرەو ژوورەکە))

زوبێر: بەدڵم نەبوویت.

ڕێژوان: توخوا باوە گیان خۆم کەم کێشەم نییە، بمبورە تاقەتی هیچ شتێکم نییە.

زوبێر: دەی کەواتە با بچین سەرێکی چیمەن بدەین.

(( هەردووکیان ئەچن بەرەو ژوورەکە))

Cut

دیمەنی – ٩٤٧ – ش/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

بەهێز: ئەگاداریم بۆ هەموو ئەوانی پێشووتر بۆ دەرکە، کە دەنگیان تاقی کراوەتەوە.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.. کوڕەکانی دارەوانیش؟

بەهێز: بەڵێ ئەوان و هەموو گیراوەکانیش ئامادەکە.

ئاری: بۆ کەی؟

بەهێز: سەعات نۆی سەر لە بەیانی، تێستی تازە ئەکەینەوە.. ئەو کچەی شۆڕش وەک من گومانی لە ئاوایە، ئەم گومانەی ئێمە بێ مەڵامەت نییە، لە خۆڕاوە نەهاتووە.

ئاری: جا گەورەم سوودی چییە؟ وا ئەو دەنگە ئاواش دەرچوو، خۆ نابێتە بەڵگەیەکی بەهێز.

بەهێز: ئەبێتە قەرینەیەکی بەهێزو لەو بڕوایەدام بەوە تێ بکەوێ و وەڵامێکمان دەست بکەوێ، یان خۆی دانی پیابنێ.. ئەگینا منیش ئەزانم خەڵک زۆرە دەنگیان لە یەکتر بچێت و ئەمە تەنها گومانێکەو گومانیش بۆ بەرژەوەندیی تۆمەتبار لێکئەدرێتەوە.

(( ئاری تحیەو سەرچاو کردن و چوونە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٤٨ – ڕ/ن – ماڵی گێلاس:

(( نینا بە کوڵ ئەگری و گێلاس دڵنەوایی ئەکا ))

گێلاس: دەدەی کچم کێ ئەڵێ ئاوا کوشتوونی؟ تۆ بۆ ئەوەندە ڕەشبینیت؟

نینا: پورێ گیان لەو زیاتر کەس لە کوشتنی باوکم و ڕۆڤە گیان سوودمەند نابێ.. من وامزانی مردنەکەیان قەزاوقەدەرە، چووزانم کوژراون.. ئەها چەند بە ئاسانیی لە خشتەی بردم، براو باوکی خۆم ڕۆ بۆ گەمژەیی من.

گێلاس: نینا گیان تفەنگ بە تاریکە شەوەوە مەنێ باوانم.. جارێ ڕوون نییە کێیە، خۆ ئەگەر ئاوا دەرچێ، دڵنیابە ملی بە پەتی سێدارەوە ئەبینیت و حەددی نابێ ببێ بە مێردت.

نینا: بە گۆڕی هەردوو جوانەمەرگ، دەربکەوێ ئەوە، ناهێڵم بگاتە پەتی سێدارە، بە دەستی خۆم ئەیکوژم و ئیتر با منیش بخرێمە لای باوک و براکەم.

گێلاس: ئای ئای ئای ئەوە چییە ڕۆڵە؟ ئیتر ئەوە ئیشی یاسایەو ئەبێ پشوومان درێژ بێ لەگەڵیا گوڵەکەم، جارێ دڵی خۆت سەغڵەت مەکە توخوا، کەمێ ئارام بگرە.

نینا: بەخوا هەر ئەو دەرئەچێ.. من ئەزانم سەر دارەوانە گۆڕبەگۆڕەکەی باوکی داوەو هەر خەریکی دزیی و پیاوکوشتن و خراپەن.

گێلاس: تەحەمولت بێ گوڵەکەم، باوک و برای تۆن، براو برازای منیشن کچەکەم، تۆ ڕاست ئەکەی، منیش هەر گومانم بۆ ئەو ئەچێت، بەڵام ئەوە بانگ کراونەتەوە، بزانین چی ئەبێ.

نینا: باشە تکات لێ ئەکەم، توخوا تۆ مەهێڵە پێ بنێتە ئەم دەرگایە، نامەوێ سەرو فەسساڵی ببینم، بەخوا بیبینم شێت ئەبم پەلاماری ئەدەم.

گێلاس: باشە کچم، بەسەرچاو، خەمت نەبێ، ئەو ئەگەر وێرای بێتە ئەم دەرگایە، بەڵێن بێ چینێکی باشی پێ بکەم و پێی بڵێم، برۆ چارەت نەبینینەوەو بەرۆکمان بەردە. ______________ Cut ______________

دیمەنی – ٩٤٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن غەمبارەو خدر قلق دانیشتوون))

خدر: نا بڕواناکەم، جارێکیتریش ئەوە کراوەو سەلامەت دەرچوون، تۆمەتیش بەزۆر ساغ ناکرێتەوەو پۆلیسیش بەدوای ڕاستیا ئەگەڕێ، خۆ ناگەڕێ بەدوای ئەوەیا گومانی کێ ڕاستەو هی کێ هەڵەیە؟!

نارەوەن: ئاخر کچەکە کە مارەش براوە، هەر گومانی لە ئاوایە، باوەڕ ناکەی کە سەرم لێدان خۆی و گێلاس چییان پێکردم؟ هەر بە ئاشکرا کردیانمە دەرەوە.

خدر: لێیان مەگرە تازە زانیویانە کە ئەو دووانە کوژراون.. ئەگەر خوا بکا ئەمڕۆ ئاوا سەلامەت بێ، دواتر خۆیان چاک ئەبنەوەو ڕووپەرمایی دنیاشتان بۆ ئەکەن تا دڵتان چاک بێ.

نارەوەن: تۆ گەشبینیت و منیش ترسەکەم گەیشتۆتە ناو سکۆڵەکانی دڵم، هاکا ئێستا نا کەمێکیتر جەڵتەکە لێیدام.

خدر: نا نا نارە گیان، ئەوەندە بێ ورە مەبە، من دڵم باش ئەهێنێ.

نارەوەن: دڵی دایک و کەسێکیتر هەر زۆر جیاوازن خدر گیان.

خدر: وتت شەنیا هاتبوو؟ شەنیاکەی ئامۆ؟

نارەوەن: بەڵێ، بەڵام من لە چییام و ئەویش لەسەر زەوقی خۆی، حەوسەڵەی هیچم نەبوو، پێموت کاتێکیتر سەرم لێبدا.

خدر: دەی خۆ ناکرێ ئەوەندە تایبەت بی بەم باسە هیچیتر نەبیستی؟!!!

نارەوەن: دایکم دایک، خدر گیان.

خدر: ئەچم سەرێک ئەدەم بزانم چی ڕووئەدا.

Cut

دیمەنی – ٩٥٠ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز بە پێوە، مفەوەز دانیشتووە، هەڵشۆ لەسەر کورسییەکی تەنیا ))

بەهێز: زۆر ورد ئەبیتەوە هەڵشۆ! هەر یەکەیان دووجار ئەیلێیتەوەو تۆ بە وردیی گوێ ئەگری، ئەوەندە تەرکیزت هەبێت، گەر دەنگەکە بەحاڵ لەوچوو، ئەتوانین بیست جاری پێ دووبارە بکەینەوە.. هەڵشۆ، ئەوە خزمەتکردنی خەڵکی شارو وڵاتەکەتە، کە نەهێڵی تاوانبارێکی وا زیان بە خەڵک بگەیەنێت.. مەردانە بتبینم هەڵشۆ.

هەڵشۆ: باوەڕم پێ بکە گەورەم وەک وتم، من زۆر لە تۆ زیاتر حەز ئەکەم ئاشکرای بکەم، ئێستا ئەزانم چۆن بە بێ هیچ بەرژەوەندییەک ئێوە شەو و ڕۆژ بۆ خەڵک ماندوو ئەبن و ئێمەش چیمان بە خەڵک کردووە.

بەهێز: دەی کەواتە جوان گوێ هەڵخەو تەرکیزی ورد.

هەڵشۆ: باوەڕ بکە گەورەم وردو درشتی ناوێ، هەر یەکەم وشە ئەزانم ئەوە یان نا؟

بەهێز: دەی با دەست پێبکەین.. (( بە مۆبایل)) ملازم ئاری A . (( مۆبایلەکە ئەخاتە بەرگوێی هەڵشۆ، پاش کەمێک گوێگرتنی هەڵشۆ))

هەڵشۆ: زۆر دڵنیام ئەو نییە.

بەهێز (( بە مۆبایلەکە)): ملازم ئاری B .

هەڵشۆ(( بە هەمانجۆر بەهێز مۆبایلەکە ئەنێت بە گوێیەوە))(( بە ترس و لەرزەوە)): بەڵێ میری گەورەم لە خزمەتتام. (( بۆ بەهێز)) وامزانی لە دەرەوەم و ئەمری هەیە.

بەهێز(( خۆشحاڵیی)): تۆ دڵنیایت ئەوە دەنگی میر بوو؟

هەڵشۆ: هەر زۆریش گەورەم، کامیان دەرچوون؟

# (( ئەڵقەی چل و شەش))

بەهێز(( بە مۆبایلەکە)): ملازم ئاری با B دووبارەی بکاتەوە.

هەڵشۆ: گەورەم باوەڕ بکە پێویست ناکات، دەنگی ژنەکەم و ئەم میرەم قەت لێ ناگۆڕێ، چونکە لە هەردووکیان زۆر ئەترسام.. (( بەهێز مۆبایلەکە ئەنێتەوە بە گوێیەوەو زۆر خێرا هەڵشۆ ئەڵێ)) بەڵێ گەورەم خۆیەتی.

بەهێز(( بە مۆبایل)): مولازم ئاری سەردار بێنە.

Cut

دیمەنی – ٩٥١ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی لە ماڵەوە دێتە دەرەوەو ئەچێت بۆ سەیارەکەی، جەڕەسی بۆ دێت))

ڕەمزی(( مۆبایل)): هیچ گۆڕانکاریی هەیە؟

دەنگ: گەورەم ئاشکرا کرا.. هەڵشۆ ناسییەوە.

ڕەمزی(( زۆر تێک ئەچێ)): بەڕاست؟ هەموو شتێک زانرا.

دەنگ: جارێ تەنها ناسینەوەی بوو، لێکۆڵینەوەی سەرەتایی لەگەڵ نەکراوە.

ڕەمزی: باشە دەستخۆش.

(( مۆبایل هەڵئەگرێتەوەو بەرەو ژوورەوە ئەچێ))

Cut

دیمەنی – ٩٥٢ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی دیدەوان:

(( دیدەوان لە دەرگا دێتە دەرەوە با قاتەوە.. بە پێ ئەڕوات.. پاش کەمێک زەنگی بۆ دێت))

دیدەوان: ها ڕەمزی؟

ڕەمزی(( دەنگ)): ئاگاداری هیچ هەیت؟

دیدەوان: زۆر باش!!!.. پێیان وتم.

ڕەمزی: من چی بکەم؟

دیدەوان: لە ماڵەوە دانیشە، وا دێم بۆ لات.

ڕەمزی: کەمێک پێ هەڵگری باشترە، بۆ بە تەکسیەک نایەیت؟

دیدەوان: هیچ نییە گوێی مەدەرێ، هیچ ڕوونادا! حەزم لە سەرکەوتنی سەیارە نییە، هەر بە پێ دێم، زۆر دوور نیین لە یەکەوە.

ڕەمزی: تا نیوسەعاتی تر چاوەڕێت ئەکەم.

دیدەوان: ئەتگەمێ.

Cut

دیمەنی – ٩٥٣ – ڕ/ د – بەردەرگای بنکەی پۆلیس:

(( خدر لە بنکەی پۆلیس دێتە دەرەوەو ئەچێتە سەیارەکەیەوەو تێل ئەکا ))

خدر: مزگێنیم کەوت، میرەکە دۆزرایەوە هاهاها.

Cut

دیمەنی – ٩٥٤ – ڕ/ د – غازفرۆش:

(( عارفی تەمەن ٥٥- ٦٠ ساڵ شەرواڵ و کراس غازفرۆشەکەیەو مناڵێک لەبەردەستیا هەڵئەسوڕێ.. زاهید دێت بۆ لای))

عارف: ها زاهید؟ تەواو؟

زاهید: ئیشێ کاکە عارفی خۆمان کردبێتی هەر سەرکەوتوو ئەبێ.

عارف: سەرۆک گەڕاوەتەوە بینیت؟

زاهید: جارێ بە خزمەتی نەگەیشتووم.

عارف: کاتت بۆ دانراوە بیبینی؟

زاهید: ڕەنگە ئێوارە بیبینم.

عارف: زۆر باشە پێی بڵێ مریەم عەوداڵیەتی، بەیانی دێتەوە بۆ لای من بۆ وەڵامەکەی.

زاهید: کە ئەوەندە پەلەیە، بۆ بە کاک ڕەمزیت نەوت؟

عارف: نازانم چی ڕوویداوە، تەلەفونی داخستووە.

زاهید: ئۆو قەت کاک ڕەمزی تەلەفون داناخا، دیارە شتێک هەیە، من ئەچم بۆ کارگەو بۆ ماڵیان، نەک شتی خراپ ڕوویدابێ؟!

عارف: منیش دڵنیا بکەرەوە.

Cut

دیمەنی – ٩٥٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو ڕەمزی و شەنیا.. ڕەمزی کەمامەی بە دەمەوەیە، خۆی بێتاقەت نیشان ئەدات))

نیگار: مانگێک زۆرە کاک ڕەمزی، مەگەر ئێرە داخەین.. هەڵامەتێک مانگێکی بۆچییە برا؟

شەنیا: منیش پێموت زۆرە، بە قسەی نەکردم.

ڕەمزی: من خۆم ئەناسم نیگار خان، باوەڕ بکە تا مانگێکیتر ناتوانم بەو جددیەتەی جارانەوە ئیش بکەم، ئەبێ بمبوری.

نیگار: نییە! من دامنابوو دوو ڕۆژ پشوو بیت، ئەوا کردم بە هەفتەیەک، لەوە زیاتریش نییە.

ڕەمزی: جا تۆ پێنج مانگیشم بدەیتێ، کە باشبم، خۆم بۆ ناگیرێ، هەر دێمەوە.

نیگار: بەڵێ ئەتناسم، بۆیە ئەڵێم هەفتەیەک.

ڕەمزی: ئەکرێ شەنیا ببەم، هەندێ پێداویستیم لایە لەماڵەوە، بیدەمێ؟

نیگار: بۆ نا؟ ئەگەر شتێکیش ماوە نەیزانێ خۆت فێری بکەی، زۆر باشتریش.

شەنیا: نا خۆمی ئازیزم، پێرفێکتم.

ڕەمزی(( نەرمە پێکەنین))" بەڵێ پێرفێکتە عەیبی نییە.

شەنیا: لە سەرەتاشەوە ئاگات لێ بوو چی پێئەکردم؟

نیگار: ئەی بۆ ئەوەی بوو ئاوا پێرفێکت بی، کە خۆی کاری هەبوو یان نەخۆشکەوت جێی بگریتەوە، ئەویش کەم نییە.

ڕەمزی: دەی ئێمە بە یارمەتیت.

نیگار: خواحافیزتان بێت. (( ڕۆشتنی شەنیاو ڕەمزی))

نیگار(( مۆبایل هەڵئەگرێ و تێل ئەکا )): ئەلو ........... باشی زوبێر گیان؟ ............
زۆر سوپاس ئێمە باشین.............

(( لە میوتیدا تێلەکەی تەواو ئەکا ))

_______ تابع _______________ Cut ___________________

دیمەنی – ٩٥٦ – متبوع – ڕ/ د – ناو کارگەی ئاسنگەریی:

(( شەنیا پێی لە پارچە ئاسنێک هەڵئەکەوێ و ئەکەوێ بە دەما، قاچی ئەبڕێ و خوێنی لێدێت.. ڕەمزی دەسماڵ/ دەسڕێکی پەڕۆیینی نایابی تایبەت لە گیرفانی دەرئەهێنێت و لە قاچی شەنیای ئەبەستێت، شەنیا دیقەتی دەسماڵەکە ئەدات.. یەک دوو کرێکار دێن))

ڕەمزی(( بۆ کرێکارەکان)): هیچ نەبوو، بچن بەلای ئیشتانەوە (( دوو کرێکارەکە ئەڕۆن))

شەنیا: ئەو دەستەسڕیت لە کوێ بوو؟

ڕەمزی: دەسماڵەکە ئەڵێی؟

شەنیا: بەڵێ (( ئاماژەی قاچی ئەکا)) ئەو دەسماڵە.

ڕەمزی: لە ژوورەکەم بوو، وتم وەک ئەم ماوەیە نایەمەوە، بیبەمەماڵەوە.

شەنیا: کەواتە ئەو پارەیەی ئامۆ دای بە باوکم گەیشتە دەستی تۆ؟

ڕەمزی: با بڕۆین ئێرە جێی ئەو قسانە نییە، لە سەیارەکەیا باسی ئەکەین.

(( ئەچنە دەرەوە))

تابع ــــــــــــــــــ Cut ــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٩٥٧ – متبوع – ڕ/د – ناو سەیارەی ڕەمزی:

(( ڕەمزی کەمامەکەی لائەبات و لەگەڵ شەنیا ئەچنە سەیارەکەوە))

ڕەمزی: لە سەردەمی کاک دارەوانەوە تا ئێستا، هەر پارەیەک دوای دابەشکردن و خەرجیی مابێتەوە بەشێکی دێتەوە لای من بە ڕێگەی تایبەتیی خۆی، بێ ئەوەی کەس ڕووبەڕووم بێتەوە.. ئەو پارەیەشی کە گولزار بەڵێنی پێدای، ئەویش لای منەو ساڵێکیتر وەری ئەگری.. بەڵێ ئەوەی لە پارەکە مابۆوە، بەو دەسماڵەوە بۆ من هێنرا.. چۆن ناسیتەوە؟

شەنیا: ئەو دەستەسڕەم زۆر لاشیرین بوو، ویستم ئامۆ پێی جوان بێ و هەڵیگرێ بۆ خۆی ، نەمزانی بایەخی ناداتێ؟!

ڕەمزی: گەڕایەوە بۆ لای خۆت. هههها.

شەنیا: باشە ئەی ئەگەر میری گەورە ناوی تۆشی بردو پۆلیس هاتن بۆ ئێرە؟

ڕەمزی: کێشەم نییە، ئەو ڕاستەوخۆ هیچی نەداوەتێ و نامناسێ.. لە زووشەوە کاک دارەوان، ناسنامەیەکی ساختەی بۆ دروستکردم و ناوینام ڕەمزی.. ئەوە ناوی خۆم نییەو ئەم ناوە نەناسراوە، سمێڵیش بتاشم کەس نامناسێتەوە، دەرباز ئەبم.. هەر ئەچمە شارێکیتریش، لەوێوە تۆو ڕەوەزو گوڵزارو ئەوانیتر ئاراستە ئەکەم.

شەنیا: ئەی ئەگەر هەر گیرایت؟ خۆ ناوی من نابەی من هیچم نەکردووە.

ڕەمزی: نا تۆ هیچت نەکردووەو هیچیش ناکەی ترسنۆک.. بەڵام من کێشەی زۆر گەورەترم هەیە، گەر میری گەورە ناوی یەک دوویەکی ناو گروپەکە ببا، ئەوان بە شێوە ئەمناسن.

شەنیا: کێشەی چی؟

ڕەمزی: پێت ئەڵێم، نەک بگیرێم، بەڵام ئەوە بزانە بە درکاندنی سەرولاشەت یەکناگرنەوە.. ئەوانەی ئیش ئەکەن، هەر گوڵزارو ڕەوەز نیین، بەڵام بۆ تۆ ئەو دووە بەسە بیانناسیت جارێ.

شەنیا: لە منەوە هیچ شتێک نادرکێنرێت، چۆن یاری بە ئاگر ئەکەم؟

ڕەمزی: تۆ ئێستا لەو کارگەیە ئیش ئەکەی، لەبەرئەوە هەرکاتێ من بگیرێم، ئۆتۆماتیکیی تۆ ئەبیت بە ژمێریارو خەزنەداری گروپەکە.

شەنیا: لەوەئەچێ ئیشتان بە من هەر زۆر زۆر بێ.

ڕەمزی: تەنها تۆ شارەزای ناو کارگە کراویت و یەکێک لە هۆکارەکانی هێنانت بۆ ناو کارگەکەش ئەوەیە.

شەنیا (( سوعبەت )): دەی قوڕەکەم بۆ خەستکەرەوە کاک ڕەمزی.

ڕەمزی: باش گوێ بگرە.. چ پارەیەک دەستکەوتووە، لە ژوورێکی نهێنیی ناو کارگەکەدایە، بەس من و کاک دارەوان ئەمانزانی.

شەنیا: کاک دارەوان پەیوەندیی چی بوو بە نیگارخانەوە؟

ڕەمزی: تۆ گوێ لە من بگرە، من باسی شتێکیترت بۆ ئەکەم، ئەوە ئیشی تۆ نییە لەو پەیوەندییە بکۆڵیتەوە.

شەنیا: فەرموو.. پارەکە زۆرە؟

ڕەمزی (( سەری شەنیا بە خڕیی ئەگرێ )): لەو ئەقڵە بچووکەی تۆیا ئەو ژمارانەی تیا نییە.. گەر بوویت بە ژمێریارو ئێمە تیاچووین، یەک دۆلاری بە بێ پرسی سەرۆک دەرناهێنیت.

شەنیا: بۆ سەرۆکیشمان هەیە؟

ڕەمزی: هەر ناوەکان ئەگۆڕین.. ئێستا کە سەرۆک زانی میر دانی بە هەموو شتێکا ناوە، بە پەلە لە ژێر ناویترا تۆڕی تازە دروست ئەکا.. تۆ ناوت لای سەرۆکەو چاوەڕوانی تەلەفونی بکە ئەگەر من گیرام.. ئەگەر میری گەورەش ناوی ئەو یەک دووەی نەدا کە پێموتی، ئەوا خۆم ئەگەڕێمەوەو ئەم باسەت وەکو نەبیستبێ، دایئەخەی.

شەنیا: بەڵێ بەسەرچاو.

ڕەمزی: کاتی خۆی فەرمانی کاک دارەوان وابوو، نیگارخان پێویستیی بە هەر ماڵ و موڵک و پارەیەک بوو، لەو ژوورە بۆی دەربهێنرێ و بە بیانوویەکەوە بیدرێتێ، ئەو کارگەیەش بەو پارەیە کڕراوە.

شەنیا: ئەی ژنەکەی؟

ڕەمزی: ئەوانی هەموو خستبووە سەرکاری خۆیان و کردوونی بە خاوەن سامانی خۆیان، کچە بچووکەکەی نەبێ، ئەویش بە ڕێگەی تایبەتی خۆمان لە داهاتوودا ئەو پارەیەی بۆی داناوە، ئەیگەیەنینە دەستی خۆی، گەورە بووەو زانکۆشی تەواو کردووە، ئیتر ئەتوانێ کاروباری خۆی بە تەنیا بەڕێوەبەرێ.

شەنیا: ژوورەکە کامەیە؟ با هەر بیزانم.

ڕەمزی: ئێوارە پرس بە سەرۆک ئەکەم و کە تەلەفونم بۆ کردی، وەرە بۆ ماڵەوە پێت ئەڵێم.

(( دایالۆگ لە میوتیدا ))

ـــــــــــــ ربط ـــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٩٥٨ – ڕ/ د – ساحەی نەخۆشخانە:

(( ڕێژوان چەند جارێک تێل ئەکات و داخراوە))

ڕێژوان: ئەرێ خۆ هەر بەڕاست دایخستووە ئەو چەتیوە!! .. ماڵیشی پێ تێکدام و دەسێکی تەڕیشی پیاهێنام.. ئاهـ !! تازە چۆن لەڕووم هەڵبێت بچمەوە بەردەمی سەلوا.. ڕێک مەگەر ئەم تەڵاق بدەم و پاش ماوەیەک یەکێکیتر بێنم... ئای خوایە!! ئەی باوکم چۆن ڕازیی ئەبێت و یەکێکیتری وەکو سەلواشم چۆن دەسکەوێتەوە؟.. نا نا.. جارێ با بڕیار نەدەم، کێ ئەڵێ تێست نییە، بزانێ چی ئەکەم؟ با پەلە نەکەم باشترە.

(( ئەگەڕێتەوە بەرەو ناو نەخۆشخانە تەواو نەکراوەکە))

Cut

دیمەنی – ٩٥٩ – ڕ/ د – بەر کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەوەز وەستاوەو عەلاگەیەکی ڕەشی بە دەستەوەیە.. بۆ ئەوبەرەوە ئاماژە ئەکات و ئەردەڵان بانگ ئەکا، ئەردەڵان ئەگاتە لای))

ڕەوەز: ئاوا هاتۆتەوە، لێرە هیچ ڕوون نییە.. ئەوبەرەوە چی؟

ئەردەڵان: وەڵا کاکە ڕەوەز گیان چی بێ لە تۆ نهێنی، زۆر دڵخۆش دیارن، ئیتر نازانم چی ڕوویداوە، هیچم دەست نەکەوت بۆیە لەوکاتەوە نەهاتمە خزمەتت.

ڕەوەز: بچۆ چاوێکت بکە بەسەد چاو، گوێیەکت بە هەزار، هەرچیت بیست، یەک نامەی سپیی بەتاڵم بۆ بنێرەو خۆم دێمە خوارەوە.

ئەردەڵان: جا بەخوا کاکە ڕەوەز نازانم ئەوە بنێرم، نامەو شت هەر نازانم.

ڕەوەز: دەی بە ملی شکاوت، ئاخر نامە چییە نەیزانی؟ نوکەم بۆ بکە.

ئەردەڵان: ئەوەیان بەسەر هەردوو چاوم، خەمت نەبێ.

ڕەوەز: ئەو عەلاگەیەش بەرە فڕێیدە ئەتبینن لێرەی، با بزانن بۆ ئیش هاتووی.. ناوەکەی پارەیەکی تیایە بۆ تۆ.

ئەردەڵان: بەخوا پێویستی بەو عەزێتە نەئەکرد کاکە ڕەوەز گیان.. بەزیاد بێ و خوا لە کیسەو باخەڵت کەم نەکا.

Cut

دیمەنی – ٩٦٠ – ش/ د – باخەکەی ماڵی نارەوەن:

(( ئامۆو نارەوەن و خدرو تریفەو تیرۆژ لەسەر کوسیی دانیشتوون، ئاوا بە پێوەیە))

نارەوەن: ئەوەتا تیرۆژیشی دەرکردووە لە ئۆفیسەکەی.

ئاوا: تیرۆژ پەکی ناکەوێ، بەیانی ئەتوانێ بێتە لای من یان هەر شوێنێکیتر.

خدر: پەلە مەکەن، هەڵبەت سبەی لە بنکەی پۆلیس بانگ ئەکرێن و پێیان ئەڵێن سەردار بکوژەکەیە، مادام زانییان کوژراون، ئەبێ سکاڵایان هەبێ.. ئەوسا دێنەوە بەردەرگاتان.

ئامۆ: پەشیمان ئەبنەوەو هیچی ئەوتۆش نەبووە ببێ بە کێشەی گەورە.

ئاوا: هەرکەسێک لووتی دایکم بتەزێنێ، ئەبێ وا لووتی بتەزێنم بە هەموو ژیانی نەتوانێ لە بەردەمیا سەرهەڵبڕێ ئامۆ گیان.. من تازە ئەو کچەم بە یەک فلسی قەڵب ناوێ، لە بەیانی زووتر نییە تەڵاقی ئەدەم، دایکم و تیرۆژ ناکەم بە قوربانی خۆشەویستییەکی بێ مانا.

نارەوەن: ئۆو ئاوا گیان بەقوربان، بۆچی لوتم تەزیوە باوانم؟ ماڵەکە مەسەلەکە بە هەڵە حاڵیی بوون و کە بۆیان ڕوون بۆوە بەیانی، وەک خۆمان لێدێتەوە.

ئاوا: بە هەڵە حاڵیی بوونی ئەوان نییە، بە هەڵە ناسینی منە، ئەوانم ناسی.

خدر: جا گەر بێتە سەر ئەوە برا، لە ژیانتا سەدانجار ئەوە دووبارە ئەبێتەوە، کەسێک ئەناسیت و دوایی بۆت دەرئەکەوێ هەر ئەسڵەن هەڵە بووی لە ناسینی ئەو کەسەداو بە تۆبێ دەمودەست لە بیری خۆشتی ببەیتەوە.

تریفە: بۆ هەمووومان هەڵە نەبووین لە ناسینی هەڵشۆیا؟

ئاوا: من نەبێ.. جا ئەو ئەزمونەی هەڵشۆ بۆ دووبارە بکەینەوە، چاوی دەرئەهات و ملی ئەشکا، با بڕوا بەڕێی خۆیەوە، من تازە لەدڵم هەڵکەنرا.

تیرۆژ: ئەگەر لەبەر منە کە دەریان کردووم، لە بەیانی زووتر نییە شوێنێک بە ٧٠٠ دۆلار داوایان کردووم ئۆفیسێکیان بۆ بەڕێوە ببەم. (( کەس بایەخ ناداتە قسەکەی))

نارەوەن: کوڕم هێمن بەرەوە، با بزانین خۆشیان ئەڵێن چی؟

ئاوا: دڵنیابە دایەگیان مادام تۆیان لە ماڵەکەیان کردۆتە دەرەوە، نینا ڕوحیشم بێ ئێستا ئەیکێشم.

ئاوا (( مۆڕە )): کە دایکم ئەوەندە بە پیرۆز ئەزانی، گوێ لە قسەشی بگرە.

خدر: ڕاستە، ئەبێ گوێمان لێ بگری.

ئاوا: باشە لەسەر قسەی ئێوە ئەیگوێزمەوە، بەڵام دڵنیابن نان و شەقی ئەدەمێ.. ئەو هەر بە گومانی خۆی هەڵس و کەوتی زۆر ناشرینی بەرامبەر کردین.. ئەی ئەگەر دوو ڕۆژیتر وا بەشەرەو هەڵەیەکم کرد، ئەبێ چی بکا؟

خدر (( هەڵئەسێ )): بە یارمەتیتان من ئەبێ بڕۆمەوە.. بەڵام کاکە ئاوا باشتر وایە بە هێمنیی بیر بکەیتەوە.

ئاوا: هەوڵ ئەدەم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر))

Cut

دیمەنی – ٩٦١ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن مەلۆتکەیەکی لە تەنیشتەوە دانراوە لە سەبەتەیەکداو خۆی ڕاکشاوە.. سەلواو هەندرێن و تافان و کلێپەو باڵا ))

هەندرێن؛ ئەی گەورەم بە نیازن ناوی بنێن چی؟

زوبێر: با باوکیشی بێتەوە ئەوسا بڕیارێکی لێ ئەدەین، دوو بەیانی ئەگەنەوە ئێرە.
سەلوا: با ئەم کوڕە جوانەمان، خاڵۆژنی ناوی بنێت.

زوبێر: ناو ئاساییە کچم.. بۆ نمونە بە من بێ، ناوی ئەنێم ئازا، بەڵام کێ گرێنتیی ئەوەم ئەداتێ ئازا دەرئەچێ؟ لەبەرئەوە ناوەکە بۆ مناڵەکە تەنها ناسینەوەیەو گەورەش پێی خۆشە بە جیهانبینیی خۆی ناوی بنێ.. تۆ ئەزانی ئەگەر پشیلە ڕاگری بۆ نمونە ٣ پشیلە، کە پێی ئەڵێی وەرە، ئەوان هەرسێکیان وا ئەزانن ناویان وەرەیە، بۆیە بە پەلە دێن بە دەنگتەوە، وا ئەزانن شتێکیان ئەدەیتێ.

هەندرێن: کەواتە کە بە مریشکیش بڵێین دوق دوق دوق، ناوی خۆی لێ ئەبێ بە دوق دوق.

زوبێر: لە باشترین حاڵەتێکشدا وا ئەزانن ئەو جۆرە ناویان دوق دوقە.. بۆ نمونە من ناوم زوبێرە، ئەم وشەیەیە عەرەبییەو بە گشتیی دوومانای هەیە، یەکەمیان بەردو دووەمیشیان واتە پیاوێکی ئاقڵی بەهێزی توندو تیژو خاوەن ڕای پتەو، یان ڕیش سپیی، یان ئەوەی ڕاکانی هەموو لە جێی خۆیدا بن.. بەڵام من هەموو ئەوانە لە خۆما نابینم.

تافان: لە هەموو ئەو وەسفانەش زیاتری کاک زوبێر گیان.

(( هەموو ئەشهەدوو ئەکەن ))

زوبێر: بەڵام من لەسەر بۆچوون و ڕایەکی ناپتەوی خۆم، زیندانیی کرام ئەوەتان بیر نەچی، ئازاش نەبووم و توندوتیژیش نەبووم، بەڵام وەک بەردیش نەبووم هههه.

هەندرێن: گەورەم، ئەوە ڕووداوێکی بچووک بوو، بەڵام باقیی ژیانی تۆ هەموو پەندو حیکمەتە.

زوبێر: بەڵێ بەوە ئەوترێ هەڵەی بچووک، کە ئەگەر خێرخوایەک نەبووایە، ئێستا کچێک کوژرابوو.. من هەرگیز لەو هەڵەیەی خۆم خۆش نابم.. گەرچی دڵنیاشم هەریەکەو لە لایەکەوە تەماشای ئەکاو ئەڵێ، هستریا بوو، غەدر بوو، تۆڵە بوو، گوناح بوو، قوربانیی بوو، تاوانبار بوو.. کورە چووزانم هەریەکەو بە پێی ئەقڵی خۆی.

Cut

دیمەنی – ٩٦٢ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( زاهیدو گوڵزارو ڕەوەزو دیدەوان و ڕەمزی و عارف))

دیدەوان: من دەمێکە سەردار ئەناسم، ئەو پیاوی ئەوە نییە ناوی کەس ببا.. بە ڕای من سەر لە خۆتان مەشێوێنن و جێگۆڕکێ مەکەن، نەبا کەسێک هەست بە شتێک بکا.

ڕەمزی: من خەمی عارف و مریەمم بوو، سەردار ئەو دووە ئەناسێ و لەگەڵ منیشا تێکەڵن.

دیدەوان: قەت شتی وا ناکا، بەڵام ناهەقت نییە کە سڵی لێ بکەیتەوە.. بڕوانن.. دارەوان سەربارى ئەوەی کە میانەشمان تێکچوو بوو، ناوی منی نەدا، ئەوە پەیوەندیی بە بەردەوامیی کار کردنەوە هەیە، نەک بە کەسکردنی بابەت.. سەرداریش هەر وایە.

ڕەوەز: جارێ شتێکی ئەوتۆمان نەکردووە، تا لە ڕێوە بگیرێین.

ڕەوەز(( سەرسەریانە دەرئەکەوێ)): هههههە بشگیرێین هیچمان بۆ نابێ، جارێ بیسمیللا من هەر دوو سێ ئیشم بۆ کراوە.. با ئیشی گەورە بکەین، ئەوسا بشگیرێین عەوافی.

دیدەوان: سەربەخۆ ئیش مەکەن و ڕێنمایی من بە وردیی جێبەجێ بکەن، ناهێڵم کەستان توشی گێرەوکێشە بن.

عارف: سەرۆک گیان خۆمان ئەدەینە دەست تۆوە، لێت ڕائەبینین.

گوڵزار: هیچ ڕاسپاردەیەک هەیە.

ڕەمزی: ڕاسپاردەت لای منە.

Cut

دیمەنی – ٩٦٣ – ڕ/ ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز لە جێگەی خۆی و سەردار لەسەر کورسییەکی تەنیاو مفەوەزو ملازم ئاری))

سەردار: هیچ کەسێکیترم نەچاندووە بۆ دوای خۆم.

بەهێز: ڕاست ناکەیت، وەک میرەکە ئەیشاریتەوە تا بەڵگەمان دەست ئەکەوێ.

سەردار: هەرچییەک بکەن لەگەڵما سوودی نییە، تازە من ئەچم بەرەو پەتەکەو کە شتێکیش نەبێت ناتوانم بە زۆرەملێ بەسەرخۆمیا بسەپێنم.. ئێوەش هەرچیتان پێخۆشە ئەوە بکەن.

بەهێز: سەردار تازە کار لەکار ترازاوە، هەوڵ بدە لێگەڕیی یەک مسقاڵ ویژدانت بجولێ، ئەم خەڵکە مەینەتیی زۆری چەشتووە، ماڵوێرانیی و دەربەدەریی و باوک و براو ڕۆڵە کوژران، برسێتیی و شەڕی زۆر.. بەرگەی زوڵم و ڕاو و ڕوتی کەسانی وەک ئێوە ناگرێ، چی نەما بەسەرمان نەیەت، ئینجا نۆرەی دزیی و کوشتن و تلیاک بڵاوکردنەوەی ئێوەیە؟

سەردار: من بۆ خۆم ئەژیم و پەیوەندیم بە کەسەوە نییە، ئەوانەی وەک منیشن زۆرن کەم نیین، خۆشت باشیان ئەناسی.

سەردار(( زەنگ لێ ئەدا)): ئێستا کەسیش پەیوەندیی بە تۆوە نییەو کەس بەرگرییت لێ ناکا، هەر خۆت بە (( پۆلیس دێتە ژوورەوەو تەحیە)) تەنیا برۆ، ڕووبەڕووی سزاکانت ببەوە.. (( بۆ پۆلیس)) ببیەوە جێگای خۆی. (( پۆلیس سەردار ئەبات)) (( بۆ ئاری)) گەر بەم گروپە دواییان بێت، ئەتوانین سەرکەوتن ڕاگەیەنین بەسەر مەترسیدارترین گروپی کوشتن و فڕاندن و دزیی و ماددەی هۆشبەردا.

ئاری: بەو هیوایە گەورەم.

Cut

دیمەنی – ٩٦٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( نیناو گێلاس دانیشتوون))

نینا(( خەجاڵەت)): ئەی ئێستا چی بکەین پورێ گیان؟ ئاوام لەدەستچوو؟

گێلاس: کێ ئەیزانی ئەو مامە سەردارە، بەتەمای دەستبەسەراگرتنی تۆ بووە دوای کوشتنی ئەوان.

نینا: ڕۆڤان گیانی لەبەر ئەو وێنەی دزە کوشتووە کە کێشابووی، باوکیشم لەسەر دڵی سافی خۆی بۆ ئەو دۆستەی گێڕاوەتەوە.

گێلاس: بۆیە ئەڵێن ئەوی دۆست پێت ئەکا، حاشا قەت دوژمن نایکا.

نینا: تۆ ئێستا پێم بڵێ چۆن دڵی چاک بکەمەوە؟ ئێمە هیچمان تیا نەهێشتەوە، من خۆم دڵنیا بووم کە هەر ئیشی ئەوە.

گێلاس: نازانم، بەڕاستی نازانم.. تۆ ئەزانی چ شین و باوکەڕۆیەکت دەست پێکردەوە؟ منیش لەبەر تۆ، هەموو شتێکم کرد.

نینا: پورێ گیان توخوا چارەسەرێکم بکە، بەخوا زۆرم خۆش ئەوێ، ئەشزانم کەس ئەوەم بۆ ناکا کە ئەو ئەیکا.

گێلاس: با جارێ بیرێکی لێ بکەمەوە، بەڕاستی خراپ ترشاوە، نازانم.

نینا: من بچم داوای لێبوردنی لێبکەم؟

گێلاس: نا ئەوە ناکەی.. من خۆم شتێک ئەکەم.

نینا: پورێ گیان بەساقەوبم کەمێ خێراکە، بەخوا جەڵتە لێم ئەدا.. ئەی خەڵکیش ناڵێن بۆچی پێش گواستنەوە تەڵاقدراوە؟ ئەو قسەیە خۆش نییە پورێ گیان، فریامکەوە.

گێلاس: دەباشە باش مێشکم مەبە، تۆ بە تەکسیەک بچۆرەوە بۆماڵەوە، با من لێرە بە تەنیا بیر بکەمەوە.

نینا: بەخوا ناتوانم پورێ گیان، بە تەنیا شێت ئەبم.. لێرە دائەنیشم و هیچ ناڵێم، تا بە باشیی بیر ئەکەیتەوە.. بەڵێن بێ.

گێلاس: هیچ ناڵێی؟

نینا(( دەست ئەهێنێ بەدەمیا )): ئەهـ!!

(( بێدەنگیی، پاش کەمێک ))

گێلاس(( هەڵئەسێ )): تۆ یا لێرەبە، یان بچۆرەوە بۆ ماڵەوە، من سەرێکی نارەوەن ئەدەم.

نینا: بەخوا پورێ گیان ئەوە بۆ شانی تۆ جوان نییە با خۆم بچم.

گێلاس: هەموو شتێک بەسەر خۆما ئەهێنم و زۆر جوانیشەو هیچیشی تیا نییە، هەمووی لە پێناوی تۆیا گوڵەکەم.

(( نیناش هەڵئەسێ و باوەشی پیا ئەکا.. خواحافیزیی و ڕۆشتنی گێلاس ))

Cut

دیمەنی – ٩٦٥ – ڕ/ د – بەر دەرگای کارگەی نیگار:

(( دەوران بە سەیارەکەی دێت و دائەبەزێت.. شەنیا بە خوذەیەکی ئاسنگەرییەوە بەرەو ژوورەوە ئەچێت و دەوران ئەبینێت و ئەگەڕێتەوە بۆلای ))

دەوران(( بە دەنگی بەرز)): ها کرێکارە جوانەکە بۆ کوێ؟

شەنیا: ئێمە ئیشمان هەیە خۆ وەکو تۆ دەستمان بەتاڵ نییە!

(( یەکتر ماچ کردن و هەواڵ پرسین))

شەنیا: خێرە هاتووی؟

دەوران: لە نێوانمان دەرنەچێ، خوشکە تازەکەم منالّی بووە لەگەڵ دایکما پێیەوە ئەچین.

شەنیا: خوشکە تازەکەت کێیە دەوران؟

دەوران: ئەی دایکم شوو ئەکا بە باوە زوبێرو ئەویش دوو کوڕو کچێکی هەیە.

شەنیا: یەعنی کردیان بەڕاست؟

دەوران: ئەی ئاگات لەچییە؟ من و باوە زوبێرو دایکم پێکەوە ئەژیین.. بەس بەخوا پیاوێکی رووحە ڕوح.

شەنیا: ئەک بە خۆشیی بێ بەدزیی منەوە هههە.

دەوران: نا هیچ شتێ لە تۆ شاراوە نییە، تۆش کەم نیت.. هەموو شتێکت بیستووە.

شەنیا: وەڵا خۆی هیچی نەوتووە، بەڵام هەر یەکەمجار پێکەوە بینیمن، هەموو شتێ تێگەیشتم.

دەوران: ئەی ناڵێم کەم نیت، دەی با بچینە ئۆفیسەکەی.

(( ئەچنە ژوورەوە)) ________________ Cut ________________

دیمەنی – ٩٦٦ – ڕ/ ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ بە جلی دەرەوەو تریفە جلی ماڵەوە))

تریفە: بە دایکم بڵێ کچێ، زۆر توڕە ئەبێ، خۆیان لەسەر کەم گرژ نیین.

تیرۆژ: پێویست ناکا، خۆ منداڵ نیم، شەوێش باسمکرد کەس نقەی لێوە نەهات.

تریفە: کەرە ئەوە گاڵتەیان بە قسەکەت هات و کەس وەڵامی نەدایتەوە، نەک مانای وابێ ڕازیی بووبن.

تیرۆژ: کەیفی خۆیانە، من بۆ ئیش ئەچم، ئۆفیسێک دائەنێم کەلوپەل بۆ خەڵک ئەهێنمەوە لە دەرەوە.

تریفە(( بە سوک زانین)): ئەمە تۆ؟؟؟؟

تیرۆژ: بەڵێ کە هاتمەوە ئەیبینی، بۆت باس ئەکەم داهاتی چەند باشە.

تریفە: من ئەڵێم مەڕۆ، دوایی هەرچییەک ڕوویدا خۆت لێی بەرپرسیاری.

تیرۆژ: دڵنیابە یەخەی تۆ ناگرم، باش؟؟؟

(( چوونە دەرەوەی تیرۆژ.. دیمەنی حەوشەش وەربگیرێت و چوونە دەرەوەی لە دەرگای ماڵیشەوە، تا دیمەنی سەرسوچی ماڵیان))

______________ Cut ______________ تابع ______________

**دیمەنی – ٩٦٦ – ب – متبوع – ڕ/ د - حەوشەی ماڵی نارەوەن و چوونە دەرەوەی تیرۆژ.**

**دیمەنی – ٩٦٦ – ج – متبوع – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن و خێرا ڕۆشتنی تیرۆژ بۆ دیمەنی دواتر.**

دیمەنی – ٩٦٧ – متبوع – ڕ/ د – سەرسووچی کۆڵانی ماڵی نارەوەن:

Mute

(( ڕاماڵ وەستاوەو تیرۆژ دێت و بە پەلە ئەچێتە سەیارەکەیەوە ))

Cut

دیمەنی – ٩٦٨ – ڕ/ د - نەخۆشخانەی زوبێر/ ژووری ئامۆ:

(( تێبینی: ژوورەکە پەنجەرەکەی PVC صاجیبە))

(( زوبێر بە پێوە، بە دیار ئامۆوە وەستاوە))

زوبێر: بەڕاستی ئەوە کێشەیە.. ئەبێ ورد بیری لێ بکەنەوەو ئاقڵانە چارەسەر بکرێ. ئەوە وەکو بەزمەکەی ڕێژوان وایە بە جۆرێکیتر، لە جیابوونەوەکەیا لە یەک ئەچن.

ئامۆ: ئەوان چییان بەسەرهات؟

زوبێر: دەوران دڵنیای کردمەوە هەموو شتێک کۆتایی هاتووە، ماوەتەوە ڕێژوان، ئەویش وا وردە وردە بە لالووتەوە دەمودوویەکی هەیە لەگەڵ سەلوا، لە چارەسەردایەو جارێ نامەوێ هیچ بڵێم.. خۆ ئەگەر ڕێژوان چاک نەبێت، دوو دێرم پێیە، بەسە بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشەکەیان.

ئامۆ: دەسا هیمەتێ بۆ ئێمەش بکە مامە زوبێر گیان، بە ڕاستی مەگەر تۆ فریاکەوی، ئەگینا ئاوا کەللەڕەقییەکی خراپ گرتوێتی.

زوبێر: دەی وا ئێستا ئەچم بۆ ئۆفیسەکەی دایکت، با ڕەزامەندیی ئەو وەرگرم و ئەوسا شتێک بەشتێ هەر ئەکەین.

ئامۆ: منیش دێم، با پێکەوە بین.

زوبێر: هەر زۆر باشتریش.(( زەنگی بۆ دێت وەڵام و سڵاو)) چۆن؟؟؟؟....... بە ڕاستتە؟ ............ ئەوە هاتمەوە نەڕۆن....... هەر ئێستا، هەر ئێستا! (( مۆبایل هەڵئەگرێتەوە)) (( بۆ ئامۆ)) ئازیزی دڵ و دەورانی کچی لە ماڵی ئێمەن، ئەکرێ دوایخەین تا بەڕێیان ئەکەم؟

ئامۆ: زۆر ئاساییە، هەر ئەوەندەی کاتت هەبێ و ئەمڕۆ فریا بکەوی.

زوبێر: بە دڵنیایی ئەمڕۆ زۆر شت ئەکەین.. دەی کەواتە تۆ بچۆ بۆ لای دایکت و ئیزنی ئیش تیاکردنیم بۆ وەرگرەو بە تەلەفون ئاگادارم بکەرەوە.

ئامۆ: زۆر باشە، هەرچەندە ئیزنی ناوێ خۆت گەورەی هەمووماني، بەخوا دایکم خۆی بە خوشکە بچوکت ئەزانێ.

زوبێر: نا کوڕم، کەس نازانێ بە چ لایەکا ئەشکێتەوە، دایکیشت سەری گەورەتانە، با ئاگادار بێ جوانترە.

ئامۆ: بەڵێ باشە، بەدڵی تۆ.. فەرموو.

(( ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٦٩ – ڕ/ د - چایخانەکە:

(( گێلاس بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەچێت و ئەردەڵان دانیشتووە چاو لەفە ئەخوات))

ئەردەڵان(( پارووەکە لە دەمیا )): ئەمەش زیادی کرد!

هاوڕێ: مردووت مرێ تۆ پارووەکەو قوزەڵقورتکە، ئەوسا توانج بە.

ئەردەڵان: پاروو خۆی ئەڕوا، بەڵام وتم پێش ئەوەی ئەوە بڕواو لە دەستم بچێ، با قسەکەشم بڕوا.

هاوڕێ: جا چییە؟ با دەیتریش بێت، چی لە باری شانی تۆ سووک ئەکا گێلە!؟

ئەردەڵان: چۆن؟ ئەگەر وا بڕوا پیاوەکان هەموو دەرئەکەن و ئەبێتە چاخانەی ژنان.. جا ئەوسا ..........

هاوڕێ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): جا ئەوسا تۆش یەکێکیان ئەهێنیت؟

ئەردەڵان: نا بێ ئەقڵ، ئەوانە کوا پارووی منن؟

هاوڕێ: ئەی ئەوسا چی؟

ئەردەڵان: تۆ ناهێڵیت بفەرمووم.

هاوڕێ: دەی بفەرموو تێی توڕێنە!

ئەردەڵان: ئەوسا ژنان دڵیان لە پیاوان باشترە، زیاترم ئەدەنێ و کۆڵی کەمتریشم پێ بارئەکەن.

هاوڕێ: هەی ترحێو کە چاکت نەزانی!! گەمژە! ژنان ڕوحیان بەسەر یەک دینارا دەرئەچێ، مەکە هیچ ناکەن ئێستا بۆت هەڵئەڕێژن؟!!!! ئاخر ئەوە ئەقڵەکەتە بۆیە..........

ئەردەڵان: من ژنم ئەدەنێ، خۆم نامەوێ بیهێنم.. نەڵێی بۆیە ژنت نادەنێ ههە.

مەبەستم ئەوە بوو ئەوە ئەقڵەکەتە بۆیە ............

ئەردەڵان(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): ئەزانم ئەڵێی چی! هەر لەفە ناخۆم، دوێنێ سادەیەکم خواردووە خۆ خان نییە؟

هاوڕێ: گەمژە مەبەستم ئەوە نییە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم بۆیە هیچت نابێ بە هیچ.

ئەردەڵان: ئەمەیان تازە بوو، بەیانی وەڵامی ئەمەشت ئەدەمەوە.

(( ئەردەڵان چاکەی ئەخواتەوە))

Cut

دیمەنی – ٩٧٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی کارگەی ڕاماڵ:

(( تیرۆژو ڕامال دانیشتوون، ساردی یان شەربەت لە بەردەمیاندا ))

ڕامال: من تەنها شوێنێکم مەبەستە هەتبێت و بە ئیسراحەت بتوانم بتبینم.

تیرۆژ: ئێ ئەوە دەسکەوتە، یەعنی هەرچیم بوێ فەرمانم بە جێیە؟ هههە.

ڕامال: تەنها ئەمر بکەو هیچیتر.

تیرۆژ: ئەی ئەگەر بمەوێ بۆ نمونە، بۆنمونە ..... (( بیرکردنەوە )) مەلەوانگەو چێشتخانەیەکم هەبێت.

ڕامال: هەردووکیان بەیەکەوە؟

تیرۆژ: نا، هەر مەبەستم قسە بوو.

ڕامال: یاڵلا هەردووکیان بەیەکەوە.

تیرۆژ: مادام ئەوەندە سەخیت، با بیر لە ئیشێکی باش بکەمەوە هههههە.. بەلام بۆ هەموو شتێک بۆ من ئەکەی؟ باشتر نییە تێبگەم؟

ڕامال: من هیچ بۆ تۆ ناکەم، پارەیەکت ئەخەمە بەردەست بۆ ئیشێکی باش، کە داهاتێکی باشی هەبێت.. دڵنیابە دوا بەدیناریت لێوەرئەگرمەوە لە خێرەکەی.. سەرەتا هەموو خەرجی و داهاتی لای خۆم ئەبێ، تا پارەکەم پڕ ئەکەیتەوە.. کە تەواو بوو، ئیتر شوێنەکە ئەبێ بە هی خۆت.

تیرۆژ: ئەها !!! تۆ تەنها هاوکاریی سەرەتام ئەکەیت!

ڕامال: ئەوە بۆ هاوڕێیەتیی هەر مەسەلەیەک نییە.

تیرۆژ: واو چەند دڵخۆشم کە هاوڕێی باشی وەکو تۆم هەیە.

ڕامال: گرنگ ئەوەیە ئیشێکی باش هەڵبژێریت و دەست پێ بکەین.

تیرۆژ: ئیشەکە گەورەیە، ئەبێ پرسی براو دایک و خوشکەکەمی تیابێت، با بزانم ئەوان ئەڵێن چی؟

ڕاماڵ: بە دڵی خۆت سەرپشکبە.. هەرکاتێک تۆ ئیشێکی باشت دۆزییەوەو هەموو لایەک پێیان خۆش بوو.. ئەگەر پێویستی کرد، من دێم قسەشیان لەگەڵا ئەکەم و دڵنیایان ئەکەمەوە، کە تەنها هاوکارییەو هیچیتر.

تیرۆژ: ڕەنگە لەو حاڵەتەیا قبوڵی نەکەن و بڵێن خۆمان سەرمایەکەت ئەدەینێ.

ڕاماڵ: ئەوەش باشە، بۆ نا؟

تیرۆژ: کورە پارەی ئەوان ئەوەنە خۆتێهەڵقورتێنەرو لێپرسینەوەی تیایە، هیچ حەزم لێی نییە.

ڕاماڵ: ئەی جا چیبکەین ئێستا؟

تیرۆژ: نازانم! با بچم لە خوشکەکەمەوە دەست پێ بکەم.

ڕاماڵ: پێشنیازێکیشم هەیە ئەگەر وەڕست نەکات و لێم دوور نەکەویتەوە.

تیرۆژ: شتێکی لێ تێئەگەم، زۆر نا.

ڕاماڵ: پێشنیازەکەم ئەوەیە هاوسەرگیریی (( تیرۆژ دەم دائەچەقێنێ)) بکەین و ببورە ببورە زانیشم وەڕس ئەبی.

تیرۆژ: نا قسەکەت تەواوکە، لە خەیاڵی ئەوەیا نەبووم، سوپرایز بوو.

ڕاماڵ: ئەگەر ئەوە بکەین.. هەرچییەک بێ ئەیکەم بە ناوی خۆتەوەو هیچ کێشەو بێنەوبەرەیەکت بۆ دروست نابێ.

تیرۆژ(( هەڵئەسێ)): هەستە بمبەرەوە بۆماڵەوە!

# (( ئەڵقەی چل و حەوت))

ڕاماڵ: تکایە، تکایە بمبورە نەمئەویست زویرتکەم، ئیتر شتێک بوو هات بە مێشکما، بابە ئەوە قسەکەم هەڵئەگرمەوە، بەس تۆ نەڕەنجێی!

تیرۆژ: نا بەهیچ جۆرێک زویر نەبووم.. تەنها ئەوەندە هەیە بمبەرەوە بۆ ماڵەوە، تا بیر لە هەموو قسەکانت بکەمەوەو کامەیانم پێ باشتر بوو، ئەوەیان بکەم.

ڕاماڵ (( دڵخۆشیی زۆر)): یەعنی ڕازیت بە هاوسەرگیریی؟

تیرۆژ: ئەویش یەکێکە لە ئەگەرەکان، بمبەرەوە بۆ ماڵەوەو با بە شێنەیی بیریان لێ بکەمەوەو هەر کە بڕیارمدا تێلت بۆ ئەکەمەوە.. ئەگەر بە هاوسەرگیرییەکەش ڕازیی نەبم، هیچ لە پەیوەندیی و هاوڕێیەتیمان کەم ناکاتەوە.

ڕاماڵ: تکایە پێش هەر شتێکیتر بیر لە هاوسەرگیرییەکە بکەرەوە، هاوسەرێکی زۆر باشت ئەبم.

تیرۆژ: هەه وتم هەستە بمبەوە هەی نەفرەتیی.. هیچیتر مەڵێ.. پێویستیم بە بیرکردنەوەیە، زۆر جەنجاڵت کردم.

ڕاماڵ(( بە گورجیی هەڵئەسێ)): فەرموو فەرموو.

(( ڕۆشتنی هەردووکیان))

Cut

دیمەنی – ٩٧١ – ڕ- عەسر/ د – پارکێک:

(( سەرچڵ و دڵنیا ))

دڵنیا: من تەنها بە ئیش دێمە دەرەوە، یان بمانەوێ لەگەڵ هاوڕێکانم کۆببینەوە، ئەگینا زۆر سەربەدەرەوە نیم.

سەرچڵ: بە پێچەوانەوە من زۆرم پێخۆشە سەربەدەرەوە بیت، ئەبێ هاوکاریی یەکتر بکەین و لە ئێستەوە خەمی پاشەڕۆژ بخۆین.

دڵنیا: ئاخر خەڵک جوان ناڵێن؟!

سەرچڵ: منیش نامەوێ لەماڵەوە بتبەستمەوەو ئاگات لە عەشتەبای خوا نەبێ.. دڵنیا گیان تۆ دڵنیابە من ئەبمە مێردت نەک خەڵک، لەبەرئەوە بۆ یەکتر ئەژیین باوانم.

دڵنیا: دە ئەوە باشە کە تۆ قەناعەتت وابێ.

سەرچڵ: پێمخۆشە خۆم جاروبار ئیشێکی بچکۆلانەت بۆ بدۆزمەوەو پێیەوە سەرقاڵ بی، با توشی وەڕسیی نەبیت.

دڵنیا: ئێ باش.

سەرچڵ: بەوە هەم من بەردەوام دڵم لای تۆ ئەبێ و بۆ ئیش بۆت ئەگەڕێم، هەم تۆش لەبەر من ئیشەکە بە جوانی ئەکەیت.. ئیتر لە نێوانی من و تۆدا هەر من و تۆ هەین مشوری یەک بخۆین و بۆ یەکتر بژیین و بمرین.

دڵنیا: وشەکانت هەنگوینن.

سەرچڵ: دەی من لە دەوری شانە هەنگەکەم، هەر ئەبێ هەنگوین بڕێژم.

دڵنیا: سوپاس، تۆ بەردەوام بە خۆت سەرسامترم ئەکەیت.

Cut

دیمەنی – ٩٧٢ – ڕ- ئێوارە/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( ئەردەڵان بە عەرەبانەکەیەوە وەستاوەو ڕەووەز دێت بۆ لای))

ڕەووەز: دوو کارتۆن تایتم لە ژوورەکەی خۆم داناوە.. تۆ دوایی ئەچی ئەیانهێنی و ئەیخەیتە سەر عەرەبانەکەت.. وتم بیدە بە هەر کەسێک ڕێک بۆی ئەخەیتە سەیارەکەیەوە.

ئەردەڵان: کاکە ڕەووەز گیان ئیتر وا شەوە، کەی بیهێنم؟

ڕەووەز: ئەگەر تۆ کێشەی شەوت هەیەو ناکرێ ئیش بکەی، ئاساییە حەماڵێکیترم بۆ بانگکە.

ئەردەڵان: نەوەڵا قوربان گیان هەرکاتێ ئەمر بفەرمووی من لە خزمەتتام، یاڵڵای ئەکرد نیوەی شەویش ئەبوووو.

ڕەووەز: کەواتە زۆر قسە مەکەو هەرچییەکم پێوتی جێبەجێیکەو لەسەری مەڕۆ.

ئەردەڵان: فەرمانتە، بەسەرچاو.

ڕەووەز: ئەچمە سەرەوە هەر کاتێ خاوەنەکەی هات زەنگت بۆ ئەکەم، بیبەو بیاندەرێ.
(( ئەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیا))

ئەردەڵان: بەسەرچاو وا من لێرە چەقیوم.

Cut

دیمەنی – ٩٧٣ – ئێوارە – ڕ / ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن دوو عەلاگەی بە دەستەوەیەو دێتە ژوورەوە، سەلواو کلێپەو باڵاو تافان لە ژوورەوەن، پاش سڵاو و بەخێرهێنانی سەلوا ))

هەندرێن: دادە گوڵەکەی خۆم.. قوربانت.. زۆرم پێخۆش بوو لێرە بوویت، باوەڕ بکە بمناردایە بەدواتا وا ڕێک نەئەکەوت.

سەلوا: بۆچی کاکە هەندرێن؟ شتێک هەیە؟

هەندرێن: نا گوڵەکەم، ئەم ئێوارەیە خواردنی دەرەوەم هێناوەتەوە، ئێمە مانگیی جارێک ئەم بەزمەمان هەیە، جا وا قسمەتی تۆشی تێکەوت هەر زۆرم پێخۆشە.

سەلوا: بەساقەوبم کاکە گیان، بەخوا بەهۆی ئەم مناڵبوونەی چیمەنی دشمەوە، ئەوەندە خواردنی بازاڕم خواردووە، خەریکە بڵێم لەبەرچاوم کەوتووە.. بەڵام ئەوی کاکی خۆم، موفەڕک و بەرەکەتە.

تافان: من دڵنیام تا ئێستا لەم بابەتەت نەخواردووە، خۆت نازانی چەند نەوسنەو چۆن بەدوای چەپ و چڵێسیا ئەگەڕێ؟ هههه

سەلوا: بەخوا هەر ئەوە باش ئەکات، بەڵام ئەگەر ئەوە بە مامۆستا زوبێر ئەڵێم حەی حەی حەی.. جارێ نیو سەعات نەسیحەتێکی وام ئەکا، کە ڕاستییەکەی هیچ تێ ناگەم، بەڵام قەت جارێکیتریش ئەو شتە دووبارە ناکەمەوە، کە زۆری لەسەر بوترێ هههه.

هەندرێن: مامۆستا پیاوێکی زۆر ژیرو زیرەکە، هەوڵبە سوود لە قسەکانی وەرگری زەرەر ناکەی سەلوا.

سەلوا: نەوەڵا پیاوی زەرەر لە خەڵکدان نییەو لە بەرژەوەندیی ئێمەیە کە قسە ئەکا.

کلێپە: دەی باوکە چیت هێناوە با بزانین.

باڵا: ئەی باوکم نەیوت قەت پەلەتان نەبێ لە هیچ شتێک تائەگاتە بەردەستتان؟

هەندرێن: ئەک ئافەرین بالأ گیان، کە ئامۆژگارییەکم کردن، ئەبێ بەردەوام لە بیرتان بێ.. گوێت لێ بوو سەلوا؟ ئامۆژگاریی قسە کردن نییە، بۆ مانەوەیە.. وریاترینی ئێمە ئەو کەسانەن لە قسەی سادەیا سوودێک وەرئەگرن و شتێکی پێ ڕێک ئەکەنەوە.

سەلوا: بۆ بالأو کلْپە ئەوە تەواوە کاکە.. بەڵام بەخوا من لێبوومەتەوە.

هەندرێن: بۆ خوانەخواست نارەحتییەکت هەیە؟

سەلوا(( ئاهـ هەڵکێشان و نیگایەک کە مانای بێئومێدیی بێت)): نا مەبەستم ئەوەیە مامۆستا زوبێر قسەم زۆر بۆ ئەکا.

Cut

دیمەنی – ٩٧٤ – ش/د – باخی ماڵی گێلاس:

(( ئاکۆو زوبێرو خدرو گێلاس و نینا ))

نینا: باشە منیش ئەڵێم هەڵەم کرد.. بەس تو ویژدانتان خۆتان بخەنە شوێنی من و حوکمبەن، کەس هەیە وابزانێ کابرایەک باوک و برای کوشتووەو هاوسەرگیریشی لەگەڵ بکا؟

خدر: نا خوشک گیان کەس نیە ئەوە بکا.. بەڵام پەلەت کرد لە حوکمە کوێرانەکەتا.

نینا: دەی من چوزانم ئەو خوێنڕێژەی پێمان ئەوت مامە، چاوی تێبڕیوم؟ ئاخر ئەوە کێ ئەهات بە خەیاڵیا؟

زوبێر: ئێستاش نەچووە بچێ، ئاساییە تۆ داوای لێبوردن لە ئاواو دایکی بکەیت و گێلاس خان تۆش لە نارەوەن خان و کچەکەی.

گێلاس: من داوای لێبوردن لەکەس ناکەم، شتێکە بە هەڵە تێگەیشتووم و هەقی خۆم بووە هەرچییەکم کردبێ.

ئاکۆ: گێلاس گیان بەوە وا ئەکەی ئاگرەکە دانەمرکێتەوە.

گێلاس: من نیوەڕۆ چوومە لای نارەوەن و ئەوە کاک حەمەخدریش شایەتە، زۆر سارد بوو لەگەڵما، داوای لێبوردنم کرد، نەیوت بوراوی، قسەیتری هێنا بەسەرا.

خدر: گێلاس خان تۆ لە ماڵی خۆتا بە قسەی ساردو سوک نارەوەن خانت دەرکرد.. ئەو هەڵەشی بەرامبەر نەکردی و بەخێرهاتنیشی کردی و دەری نەکردی.. کەواتە هەق بە تۆ نییە.

زوبێر: قسەکەی حەمەخدرە، ئەوسا ئێوە خۆتان بە دڵ بریندار ئەزانی و ئێستاش ئەوان خۆیان بە سووکایەتیی پێکراو ئەزانن.. ئەوەی ئێمە ئەمانەوێ هەڵگرتنەوەی وردەشووشەو پێکەوە لکاندنەوەی نییە، بەڵکو ئاودانی دوو گوڵە کە خەریکە سیس ئەبن... دەرفەتی زۆریان لە بەردەمدایە.

ئاکۆ: ئەگەر بە داوای لێبوردنی من دڵیان چاک ئەبێ، بابە ئەوە من لە خزمەتام.

زوبێر: بەڕای من دڵی ئاوا لە هەمووان گرنگترە چاک بکرێ، ئەوەش تەنها بە نینا ئەکرێ.. پێکهاتنەوەی ئەوانیتر ڕازاندنەوەی دەوروبەری گوڵەکانە، گەر چواردەورەکە ڕازایەوە، ئەوانیش هەر هیچ نەبێ شەرم ئەیانگرێ.

خدر: ئەوەی ئەمانەوێ بیڵێین پێکهاتنەوەی هەموو لایەکە بە دڵی پاکەوە.. ئەگەر گوێتان لێگرتووین، وابزانم شتێکیتر نەماوە بیڵێین.. ئیتر ئەگەر مامۆستا فەرمایشتێکی هەبێت.

ئاکۆ: سەرسەروچاومان، ئێمە قسەی ئێوە ناشکێنین و گێلاسیش بە خاتری نینا ئەوە ئەکا.

گێلاس: هەموو شتێک بە خاتری نینا قبوڵ ئەکەم، بەڵام با ئەو نەیەت.

زوبێر: نەخێر ئەبێ بێت.. ئەوانیش ئەبێ دڵی یەکتر چاککەنەوەو کۆتایی بەم ناخۆشییە بهێنرێ (( هەڵئەسێ)) فەرموون با بڕۆین.

(( هەموو هەڵئەسن و ئەچنە ئەو دیوی دەرگای حەوشەو ئەکرێت کۆڵان و لە دەرگادانیش وەربگیرێت))

تابع ________ Cut ________

دیمەنی – ٩٧٥ – متبوع - ش/ن – باخی ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ ئەچێ دەرگا ئەکاتەوەو زۆر گەرم ئەملاولای نیناو گێلاس ماچ ئەکات بەخێر هاتنی ئاکۆ.. نارەوەن و تریفەو ئامۆ دێن بەرەوپیریان و ئاوا ناجوڵێ))

زوبێر(( دەنگی بەرز)): ئەوە لە جێی خۆت ناجوڵێی ئاوا؟ دەی وەرە بەخێرهاتنیان بکە، هەستە دەی.

(( ئاواش دێت و بە ساردی بەخێرهاتنیان ئەکات و چوون بۆ دانیشتن و تەواوبوونی بەخێرهاتن.. ئاواو نینا کەمێک دوور لە یەک دانیشتوون))

زوبێر: هەستە نینا بچۆرە لای ئاواوە.

(( خدر لە تەنیشی ئاوایەو نینا بە بزەوە ئەچێتە لای ئاواوەو دائەنیشێت و دەست ئەگرێ بە دەمییەوە))

نینا: شێت! باشە شێت؟

ئاوا: خۆت!

نارەوەن: سوپاس بۆ کاکە زوبێرو حەمەخدر، کاک ئاکۆ ئێوەش زۆر سوپاس کە هەموو شتێکتان خستەوە ڕێڕەوی خۆی.. بەڕاستی من خوشکم نییە بەڵام بەردەوام گێلاسم لە خوشک بە نزیکتر لە خۆم زانیوە.. دوو خوشکیش هەر عاجزییان ئەبێت، گرنگ ئەوەیە بەردەوام نەبێ.

زوبێر: هەموو شتێک کۆتایی هاتووەو ئەو لاپەڕەیە داخەن.. ئێستا بێینەوە سەر ئەو دووە، گوێم لێ بوو بە یەکتریان ئەوت شێت هەهههە

ئاوا: ئەو دەستی وەشاند کاک زوبێر، من هیچم نەوتبوو.

زوبێر: سبەی نیوەڕۆ هەردووکتان دەعوەتی من و ئامۆن، تێگەیشتن.

ئاوا(( ئاماژەی نینا ئەکا)): ئەم ڕێجیم ئەکا با نەیەت.

نینا: وەڵا گاڵتە ئەکا دوو ئەوەنەی ئەو ئەخۆم. هەههە

گێلاس: با ئێمەش بمرین لە برسا قەینا.

زوبێر: کاکە هەموو دەعوەتی منن، نەک ئەو خانمە لە برسا بمرێ هههە.

خدر: نا ماموستا، ئەمان لێگەڕێ بۆ من.. کاک ئاکۆو کاکە ئامۆو نارەوەن خان و گێلاس خان و تریفە خان و تیرۆژ، لای منن.

زوبێر: تەلەفونم بۆ بکەن.. لای ئێوە خۆشترە، ئەمان دائەنێم و خۆم دێم بۆ لای ئێوە.

گێلاس: تیرۆژ نا، ئەو لە ئۆفیسە خۆم نانی بۆ ئەبەمەوە.

تیرۆژ: بەساقەی گێلاس خان بم، لێیگەڕێ، دوایی بۆت باسئەکەم.. منیش لە دەعوەتەکەیام.

گێلاس: ئەی نەمانوت هەمووی دڵی چاک بێ؟

تیرۆژ: بەخوا بەخوا دڵم هیچی تیانییە.. بەڵام خەریکە ئیشێکی گەورەم دەستکەوێ.

ئامۆ: ئەی نابێ ئاگاداری ئەو ئیشە گەورەیە بین؟ بچۆرەوە لای گێلاس خان تا باسی ئیشەکەت ئەکەین.

تیرۆژ(( بێتاقەت)): باشە.

ئاکۆ: توخوا دڵی مەشکێنە کاکە ئامۆ، تیرۆژ زۆر شیرینە، با بەدڵی خۆی بێ.

ئامۆ: من بچووکیت ئەکەم کاک ئاکۆ گیان، بەڵام با جارێ بزانم ئیشەکەی چییە.. بۆ لای ئێوە هەر هیچیشمان نەوت هەموو پێی خۆش بوو.

تیرۆژ: ئیشێکی زۆر باشە لەگەڵ....................

ئامۆ(( مۆڕەو قسەکەی پێ ئەبڕێ)): وەختی نییە جارێ، بیبڕەوە.

(( دوو دوو و سێ سێ، دایالۆگ لە میوتیدا))

Cut

دیمەنی – ٩٧٦ – ش/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( ئەردەڵان دوو کارتۆن تایت بە باوەش ئەهێنێتە خوارەوەو ئەیخاتە سەر عەرەبانەکەی و لەسەر شەقامە گشتییەکە ئەوەستێ.. لەتیف بەوێدا دێت))

لەتیف: ئەوە بەم نیوە شەوە چی ئەکەی لەمناوە ئەردەڵان، خۆ دوکان و بازاڕیش نەماوە بڵێی حەماڵیی ئەکەم؟

ئەردەڵان: ئەی نابینی بارم لە کۆمپانیاکەتانەوە هێناوەو ئێستا ئەیدەم بە خەڵک؟

لەتیف: کوڕم کۆمپانیا لە چوارەوە دائەخرێ(( تەماشای دەرگای ئەکا کراوەیە)) ئەرێ ئەو دەرگایە بۆ کراوەتەوە؟

(( سەیارەیەک دێت و کەسێک بانگی ئەردەڵان ئەکات))

ئەردەڵان: بەڵێ بەڵێ، من ئەردەلانم. (( لەتیف بەرەو کۆمپانیا ئەچێ))

کەس: ئەو دوو کارتۆن تایتەم بۆ بێنە درەنگە.

ئەردەڵان: بەسەرچاو. (( کارتۆنەکان هەڵئەگرێ بیبات و دەنگی سەیارەی پۆلیس دێت.. سەیارەکە بە هێمنی ئەردەڵان جێئەهێڵێت و ئەڕوا))

ئەردەڵان: ئەرێ ئەوە چی لێهات؟ بۆ کوێ چوو؟

(( چاوئەگێڕێ و کارتۆنەکان ئەباتەوە سەرەوە، پێشتر لەتیف چووە ژوورەوە))

______ تابع ________________ Cut ____________________

دیمەنی – ٩٧٧ – متبوع – ش/ن – کۆمپانیای ئاوا – ژووری ڕەوەز:

(( ڕەوەز بە پێوە قەلەقەو لەتیف لە دەرگاوە ماندوو نەبوونی ئەکا ))

ڕەوەز(( وائەزانێ ئەردەڵانە)): هاتن؟ ئۆو ببورە مام لەتیف وامزانی ئەو حەماڵە گێژەیت.. بەخێربێی یاخوا.

لەتیف: خێراندار بیت کاک ڕەوەز گیان، بەم شەوەو کۆمپانیا؟

ڕەوەز: وەڵا ئیتر شتیان بیرچوو بوو، تەلەفونیان کرد وتیان بۆی دێینەوە.

لەتیف: بەڵام ئێرە لە چواری عەسرەوە دائەخرێ، هەمووان ئەوە ئەزانین.

ڕەوەز: ئیشی تۆ نییە، هەڵمەدەرێ، ئیش کات و ناکاتی نییە.

ئەردەڵان(( بە کارتۆنە تایتەکانەوە دێتەوە)): کاکە ڕەوەز هات و لەپڕێکا دیار نەما.

ڕەوەز: جا دڵنیا بووی خۆیان بوون؟

ئەردەڵان: بەڵێ بەڵێ، بانگی کردم و قسەمان کرد، وتی بۆم بێنە.. لەوەدابووم بیخەمە سەیارەکەیانەوە، لەچاو ون بوون.

ڕەوەز: دەی ملی تۆ شکێ.. وەرە بیخەرە سەیارەکەی خۆمەوە، خۆم بۆیان ئەبەم.. دەی مام لەتیف ئەگەر ئیشێکت نییە بەم شەوە درەنگانە هاتوویتەوە، دائەخەین.

Cut

دیمەنی – ٩٧٨ – ش/ن – ژوورێکی ماڵی ڕەمزی:

(( شەنیا لەسەر کورسییەک دانیشتووە، ڕەمزی ناو کەنتۆر یان چەکمەجەی مەکتەبە یان هەر شتێکیتر ئەگەڕێت و کلیلێک بۆ شەنیا ئەهێنێت))

ڕەمزی، ئەمەش کلیلەکەی.. دەرگاکەی ئەکەیتەوەو سکەیە.. لەم ڕۆژانەدا کەسێک پەیوەندییت پێوە ئەکات، ناوی نسێیە، بە ناونیشانی کاک ڕەمزی وتی سکەیە.. کە ئەوەی پێوتی، ناونیشانی تەواوی وەرئەگریت و هەر پارەیەکی داواکرد ئەیدەیتێ، فەرمانی سەرۆکە.. خۆت سەرەتا بەشی سەیارەیەکی هاکەزایی پارە دەرئەکەیت بۆ خۆت، بەو سەیارەیە پارەکەی بۆ ئەبەیت.. وریابە هیچی زیاد دەرنەکەی، سەرۆک ئەیبینێ.

شەنیا: بۆ سەرۆک لەوێیە؟

ڕەمزی: نا، کامێرای چاودێریی لەسەرە.

شەنیا: تێگەیشتم.. ئەی تۆ ناگەڕێیتەوە؟

ڕەمزی: ئەگەر تا دوو هەفتەیتر هیچ ڕووینەدا دێمەوە.

شەنیا: دەبا ئەو شتانە بکەوێتە کاتێ هاتنەوەت.

ڕەمزی: تەواو نازانم ئەکەوێتە کەی! بەڵام من و تۆ فەرمان جێبەجێ کردنمان لەسەرە.. نەچوویتەوە بۆ لای نارەوەن؟

شەنیا (( پەرۆشیی )): کەستان دۆزیوەتەوە بۆ ئامۆ؟

ڕەمزی: نا جارێ کاتی چالاکیی نییە، کەسی تازەش وەرناگرین.

شەنیا: چوومەوە هەر ئەو خدرە ناشرینەکەی لەگەڵ بوو، نەچوومە ژوورەوە.

ڕەمزی: ئیتر نایەیتەوە بۆ لای من، تا پەیوەندیت پێوە ئەکەمەوە.. بڕۆ خۆت شتێ بکەو هەوڵبە زوو بە ئامۆ بگەی.ئێستا بڕۆ (( باشەی شەنیاو چوونە دەرەوەی))

Cut

دیمەنی – ٩٧٩ – ڕ/ن – ماڵی ڕێژوان:

(( ڕێژوان نان و چای بەیانی ئەخوات، سەلوا وەک بت بەدیارییەوە دانیشتووە، پاش تەواوکردنی چاکەی))

ڕیژوان: چایەکیتر.

سەلوا(( بەپەلە)): بەسەرچاو، تۆ جاروبار ئاوا قسەیەکم لەگەڵ بکە، هەموو شتێ لە خزمەتتایە.(( بەپەلە چاکەی بۆ تێئەکا ))

ڕێژوان(( پاش کەمێک)): ئەم ماوەیە باشیت، ئەگەر بەمجۆرە بەردەوام بیت، وەک جارانمان لێدێتەوە.

سەلوا(( هەڵئەسێ باوەشی پیاکا )): وەی بەساقەوبم ڕێژوان گیان.

ڕێژوان(( بە ئامازەوە)): دانیشە دانیشە.. وام نەوت، ماوەیەکیترت ماوە، بزانم چۆن ئەبیت؟

سەلوا: بەقوربانی تۆ بم چۆنت بوێ وا ئەبم بەخوا.. خۆ غەڵەتیشم نەکردووە.

ڕێژوان: با هەڵەی زۆرت کرد، بەڵام من لێی ئەبوورم، ئەگەر باشتر بیت هیچ کێشەمان نامێنێ، بەردەوام چاوم لەسەرتە بابزانی.

سەلوا: سوپاس ڕێژوان گیان.. ئەزانی هاتبوو بەسەرما خۆم بسوتێنم ئەگەر تەڵاقت بدامایە؟.

ڕێژوان: جا ئەمە بۆ خۆت ئەسوتێنی؟

سەلوا: هەموو ئەو سوکایەتیی پێکردنەی لە تۆم قبووڵکردو ئەو خۆسوتانەش لەبەر ئەوە بوو دەرەتانێکم نەبوو، ویستم باوکت بمگرێتە خۆی، ئەویش وا ژن ئەهێنێ و دڵنیام ژنەکەی قبوڵی نەئەکردم.

ڕێژوان: بۆ من چیم کردووەو چیم وتووە؟

سەلوا: ئەوەی تۆ بە منت کرد لەم ڕۆژانەیا، بە هیچ گەداو بەردەست و کۆیلەیەک نەکراوە ڕێژوان گیان.. حەز ئەکەم بزانی مانەوەشم لای تۆ، لە بێدەسەڵاتیی و بێدەرەتانیمایە. زەڕڕەیەک بەشی خۆشەویستیت تیا نەهێشتەوە، بە دەستی خۆت من و هەموو شتێکیشت کاول کرد.

ڕێژوان: ڕەنگە کەمێک توندوتیژتر بووبم لەوەی پێویست بوو، ببورە لەو پێداگرتنە.

سەلوا: دڵنیابە، نەئەتبورم نەچاوەڕێی داوای لێبوردنیشت ئەکەم، تۆ واتکرد هەموو ڕۆژێک سەد جار بۆ بێکەسیم بگریم.. بڕۆ هەواڵە بەخوابیت، من و تۆ تزە قەت نابینەوە ژن و مێردەکەی جاران، ئەوپەڕەکەی تەڵاقم ئەدەیت و منیش خۆم ئەسوتێنم.. تازە دەستم لە خۆم شتووە.. با ئەوەش بزانی، لەمەولا سەلواکەی جاران ژیان بەڕێ ئەکا، نەک بژی.

ڕێژوان: بەهەرحاڵ، هیچ لەوە ناگۆڕێ ماوەیەکیتریش تاقیت بکەمەوە، بۆ من ئەوە زۆر گرنگە.

سەلوا: چۆنت پێخۆشە وا بکە، تازە من کوژراوێکی بێ گیانم، هیچی تۆ نامخاتەوە ناو ژیان.. لەوەو پێش هەندێ ئسوڵی ژیان فێر بووم و لەمەولاش لەبەرچاوی خەڵکا ئەوانە ئەکەم.. ئیتر خەڵک چوزانێ؟ وا ئەزانن ئەژیم.

ڕێژوان: باوکم چاک فێری قسەی کردووی.

سەلوا: کاردۆی براشت تۆی فێری خۆپەرستیی و دڵڕەقیی کردووە.

ڕێژوان: با ماڵەکە تێک نەچێ، وا بیرمەکەوە.

سەلوا: جا ماڵ بۆ تێکئەچێ، من کارەکەرێکی دڵسۆزت ئەبم و بۆت ئەشنێمەوە.

ڕێژوان(( هەڵئەسێ)): من ئەڕۆم.

سەلوا: پێڵاوەکانت بۆ بێنم؟

(( ڕێژوان بە تووڕەیی ئەچێتە دەرەوە)) ____________ Cut ____________

دیمەنی – ٩٨٠ – ڕ/ د – بەردەم کارگەی نیگار:

(( نیگار لە بەردەمی سەیارەکەی وەستاوەو تێل ئەکا.. پاش سڵاو))

نیگار: ١- ئەوە بەرەو لای تۆ دێم بچینە دەرەوە ................. ٢- دەی قەینا بۆ کاتێکیتر بەساقەوبم، ئەوەش زەرورە........... ٣- نا نەوەڵا ئەیخەنە کاتێکیتر ئیسراحەتی خۆت وەرگرە ............ ٤- دەی باشە چاوەکەم، وا من ئەچمەوە ژوورەوەو چاوەڕێت ئەکەم، خۆ هەر سەعاتێکت پێ ئەچێ؟ ............ ٥- باشە گیان، دەی جارێ لە ئامانەتی خوادا بیت.. خواحافیز.

(( ئەگەڕێتەوە بۆ کارگە))

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٩٨١ – ڕ/ د - بەردەم نەخۆشخانەی زوبێر:

(( زوبێر لە دەرگای سەرەکیی نەخۆشخانە بە سەیارەکەی دێتە دەرەوەو زەنگی بۆ دێت، ئەوەستێت.. پاش سڵاو))

زوبێر: ١- ئۆوو زۆر بەداخەوە، باوەڕکە ئێستا دەعوەتم هەیە، ئەی بۆ شەو قسەت نەکرد؟ ........ ٢- کاتیتری بۆچییە باوانم، ئەگەر تۆش دێیت لە خزمەتتا بم .............. ٣- باشە بچۆرەوە بۆ کارگەکەی خۆت، من هەر نانەکە خورا، هیچی ئەوتۆ ناخۆم، دێم بۆ لای تۆو تا شەو بەیەکەوە ئەبین.. با هەندێ شتیش سەبارەت بە یەکتر بزانین، خۆ دەرفەتێکی دوو قۆڵیمان نەبووە ......... ٤- تۆ بڵێ سەعات و نیو.. نەک دواکەوم ...... ٥- باشە گیان، خوات لەگەڵ.

(( دێتە دەرەوەی نەخۆشخانە))

______________ Cut ______________

دیمەنی – ٩٨٢ – ڕ/ ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( گێلاس خۆی ئامادە کردووە بۆ دەرەوە، تیرۆژ لەسەر کۆمپیوتەرە))

گێلاس: ئەو لاپتۆپە بکوژێنەوە، هەستە بابڕۆین.

تیرۆژ(( خەندە)): نەبەخوا من نایەم گێلاس خان.. تۆ بڕۆ خوات لەگەڵ، من دوایی لای دیار شتێک ئەخۆم. ئیشی زۆریشم ماوە.

گێلاس: چاوی ئیش دەرئەهات، کە هاتینەوە بیکە.

تیرۆژ:ڕاستیەکەی ئەمەوێ کاکە ئامۆ بزانێ لەو تووڕەم، دڵنیابە نایەم.

گێلاس: دە هەستە کەی وەختی جانانەیی و مەکربازییە.

تیرۆژ: نا جانانەیی نییە، خۆم ئەزانم بەچی چاکی ئەکەم هههههه.

گێلاس: دە کەیفی خۆتە باوانم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی گێلاس، تیرۆژ ورد چاودێریی ئەکا تا بزانێ ڕۆشتووە، تێل ئەکا، دوای سڵاو لەگەڵ ڕاماڵ))

تیرۆژ: من زۆر بیرم لە قسەکانت کردەوە.. وەرە بۆ ئێرە کەسی لێ نییە، هەندێ مەرجم هەیە، جێبەجێی بکەی، بە هاوسەرگیرییەکە ڕازیی ئەبم.

Cut

دیمەنی – ٩٨٣ – ڕ/ن – ناو کارگەی نیگار:

(( شەنیاو چەند کرێکارێک سەرقاڵی بڕینەوەو قیاس گرتنن.. شەنیا زەنگی بۆ دێت، تەماشا ئەکا ڕەقەمە))

شەنیا: بەڵێ؟ فەرموو! .............. ئەها کاک نسێ، سەرچاوم (( بۆ کرێکارەکان)) دەستی لێ مەدەن ئێستا دێمەوە.. ئەچێتە شوێنێکی لاچەپ)) بەڵێ کاک نسێ.......... سەرچاوم، چەند؟............ واو زۆر زۆرە.......... بەڵێ فەرمانە ڕاستە من جێبەجێ کردنم لەسەرە............... نا من نایهێنمە ماڵ و جێی ئیش، ئەوەش هەر فەرمانە ...........بەڵێ من تەنها بەشەو ئەیهێنم............... بەڵێ شارەزام......... ئەو سەیارەیەم پێ بڵێ کە پێی دێیت؟........... زۆر باشە من لە پشتتەوە ئەوەستم و تۆ وەرە پارەکە ببە ........... وایە ڕاستە، ژمارەکەیم بدەرێ، مارۆنییە؟ ............ تەواو! ئەمشەو سەعات ١٠ و نیو لەوێ ئەبم بە پارەکەوە........ سەرچاوم، خوات لەگەڵ.

(( ئەگەڕێتەوە بۆ ناو کارگە))

Cut

دیمەنی – ٩٨٤ – ڕ– عەسر/ د – شوێنێک:

(( ڕامالْ تەلەفون ئەکا))

ڕامالْ: چاوەکەم من ئەمڕۆ پارەیەکی وام کۆکردۆتەوە بەشی ئەوە بکات کە تۆ داوای بکەیت.

تیرۆژ(( دەنگ)): تۆ بۆ وا ئەکەی بەقوربان، جارێ پەلەت چییە؟

ڕامالْ: بۆ ئەوەی هەرکاتێ ئەمرت فەرموو، دەستبەجێ جێبەجێ بکرێ.

تیرۆژ: ئای خوایە لەدەست تۆ.

ڕامالْ: ئەتوانم بتبینم؟

تیرۆژ: زۆر ببورە، نا.. ئەمڕۆ میوانداریمان هەیەو ئیش زۆرە، بۆ کاتێکیتر خۆم پێت بڵێم باشترە.

ڕامالْ: باشە گیانەکەم.. وەک وتم من پشووم درێژە، چاوەڕێتم، تۆش ئاگایەکت لەم دڵەم بێ.

Cut

دیمەنی – ٩٨٥ – ڕ – ئێوارە/ د – حەوشەو باخی ماڵی نیگار:

(( دەوران بە باخ و حەوشەکەدا دێت و ئەچێ بە هێمنی.. دەنگی سەیارەیەک دێت و سەرێک ئەکێشێتە دەرەوە.. دواتر تەلەفون ئەکا ))

دەوران: ئەرێ ئەوە لەکوێییییی؟............. کەی تۆ ئەوەندە لە دەرەوە ماویتەوە، وا نازە ئەیەوێ بڕواتەوە، هەر خۆم لە ماڵەوە ئەمێنمەوە............... هیچم بۆ مەهێنەو خۆت وەرەوە، هیچم ناوێ..................... خۆ لەگەڵ کابراتا نیت؟.............. چوزانم وامزانی منت بۆ ئەو پەراوێز خستووە............. نا بەساقەوبم نیگە گیان گاڵتە ئەکەم، لەگەڵ ئەوا بوویتایە منیش ئەهاتم بۆ لاتان، چۆن پێم ناخۆش ئەبێ؟ هههە هەی لە دایکم؟................ باشە قوربانتم، بەڵام هەوڵبە نەبێ بە شەو.......... باش، بای.

Cut

دیمەنی – ٩٨٦ – ئێوارە/ د – باخچەی قاوەخانەیەک:

(( زوبێرو نیگار دانیشتوون، نیگار دەستی لەژێر چەنەی داناوەو ورد گوێ لە زوبێر ئەگرێ))

زوبێر: ئیتر بەهۆی کەم چیکلْدانەیی خۆم و بڕیاری هەڵەی خۆمەوە، کە دکتۆری دەروونیی بە نێرگسیەتی ئەبینێ.. کەوتمە زیندانەوەو پێنج ساڵ زیندانیی کرام.

نیگار: واو پێنج ساڵ زیندانییش کراوی؟ کەواتە پێشینەت هەیە؟

زوبێر: نا، بەر لێبوردنی گشتیی کەوتم و ئەو ماڵەی کە داواشیان لەسەرم هەبوو، لێمخۆش بوون و ئا.. دەعوەتەکەی ئەمڕۆ بۆ کوڕو ژنی کوڕەکەی ئەو ماڵە بوو هههە.

نیگار: ناویان چی بوو؟ خانەدانن؟

زوبێر: تۆ نایانناسی و چیرۆکیشیان دوورودرێژە، ڕەنگە پێویست نەکا ناویان بێنین.

نیگار: ئێ دوایی؟!

زوبێر: دوایی دڵم چوو بە ژنێکی شۆخ و شەنگاو نیشانەم لێگرتەوە بیهێنم و خۆشبەختانە ئێستا لەگەڵیا دانیشتووم.

نیگار(( پێکەنین)): ئۆو وتم خوایە ئەبێ باسی کێی تر بکەی؟ هههە.

زوبێر: من زۆر تاقەتی جیهانی ژنانم نییە، وەک پێموتی ڕیزیان ئەگرم و حەزم لە قسەیان هەیە، بەڵام ڕازو نیازم زۆر کەم بووە لەگەڵیانا.. ئەوە هەموو ژیانی من خستمە بەردەستت.. ئینجا سەرەی تۆیە.

نیگار: ئاگات لێبوو دەوران تێلی بۆ کردم، ئەبێ لە کاتی خۆیا بچمەوە لای، نەک بڵێ لە ئێستاوە بێ نازی کردم.. ئەمجارەی داهاتوو کە دانیشتینەوە، من چیرۆکی ژیانی خۆمت بۆ باس ئەکەم و تۆ گوێبگرە.. باش؟ هههە.

زوبێر: بە خۆشحاڵییەوە.. (( هەڵئەسن و بەرەو کاشێر))

Cut

دیمەنی – ٩٨٧ – ش/ن – ژوورێکی بچووکی ماڵی ڕەمزی:

((ڕەمزی تەماشای کامێرای چاودێریی ئەکا، کە لەناو کارگەکەی نیگاردایەو لە ڕێی ئینتەرنێتەوە وەرئەگیرێ.. ڕەمزی تەواو چاوی لەسەر کامێراکانە.. لە پڕێکدا شەنیا پەیا ئەبێ و سکەی سەر دەرگای ژوورەکە لائەبا، دەرگای ژوورێک دەرئەکەوێ))

ڕەمزی: ئەک ئافەرین بەرخەکەی خۆم.. قوربانی.. هەر زۆر زۆر باشیت.. هەر دزیی نەکەی هیچم ناوێ، ئیتر خۆت ئەبی بە هەموو شتێکم(( ڕەمزی دەست ئەکێشێتەوە بۆ پشتەوە، وەک هێمای ئیسراحەت کردن.. شەنیا بە کلیل دەرگا ئەکاتەوەو ئەچێتە ژوورێکی پڕ کارتۆنەوەو سەری یەک دووانێکیان هەڵئەپچڕێ، چەند بەستەیەک پارە ئەبینێ و دەری ئەهێنێ، لە حدودی ٢٠٠ دەفتەر دۆلارێکداو ئەیخاتە ناو جانتایەکی گەورەو هەڵیئەگرێ و ئەچێتە دەرەوە))

ڕەمزی: واو واو چەند دەستپاکیشە، ڕێک ئەوەی دەرهێنا ماڵەکەم.. کەواتە بۆ قسە، یەک جاری بەسە. (( کامێرا ئەکوژێنێتەوەو ئەچێتە دەرەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ٩٨٨ – متبوع – ژووری دانیشتنی ڕەمزی:

(( ڕەمزی مۆبایل دەرئەهێنێ و ژمارەیەک لێ ئەدا، دوای وەرگرتنی))

ڕەمزی: بڕۆ کەروێشکەکانت وەرگرە.

(( مۆبایل دائەخاتەوە.. لە دەرگا ئەدرێت و ڕەمزی فەرموو ئەکا، ئەچێ بەرەو دەرگاو لەگەڵ دیدەواندا دێتە ژوورەوە))

دیدەوان: کێشەی تیا نەبوو؟

ڕەمزی: یەک زەڕە.

دیدەوان: کەواتە ئەو کچە سەرئەخەینە سەرەوە.

ڕەمزی: زۆر لەبارە بۆ ئەوەی کاپتنی دەستەیەکیان بێ.. زۆر نەترسیشە.

دیدەوان: ئەی ڕەوەز چی کرد؟

ڕەمزی: دەنگی سەیارەی پۆلیس پەیا بووە، کڕیارەکان ڕۆشتوون و دەنگیان نەماوە، ڕەنگە بە بۆسەیان زانیبێ.. داماوە بەو هەموو مەترسییەوە، بردوێتییەوە لەگەڵ خۆیا.

دیدەوان: ڕەمزی ئەوەم زۆر بەدڵە کە ئیشەکان هەر بە کۆمپانیای کوڕەکەی دارەوان ئەکەی.. بەڵام وریابە، ئەوەندەی بیستوومە ئەو کوڕەیان لە ژێر چاودێریایە.. ئەوە نەبێتە هەڵەی کوشندە.

ڕەمزی: نا زۆر خەمی ئەوەت نەبێ، دەگمەن وا ڕێکبکەوێ شتەکان ببەینە ناو کۆمپانیاکەوە، تەنها لەو ڕێگەیەوە ئەیگوێزینەوەو هیچیتر، ئەگینا هەرچی بچێتە کۆمپانیاکەوە، بەو حەماڵە گێژە جۆری ئەکەین.. هەر کاتێکیش گیرا، کەسمان نایناسین هههە.

دیدەوان: شوێنێکی بچوکی تر بکەیتەوە باشترە، بۆ ئەوەی بە هیچ جۆرێک نەچێتە ناو کۆمپانیاکەوە، بەڵام گواستنەوەکان، هەر لەو ڕێگەیەوە باشترینە.

ڕەمزی: بیرکردنەوەکەت تەواوە، چارەسەری ئەکەم. ________ Cut ______

دیمەنی – ٩٨٩ – ش/د – باخی ماڵی گێلاس:

(( نینا جلوبەرگی سەوزی تۆخ یان مارۆنی یان قاوەیی تۆخی لەبەردایە.. گێلاس و ئاکۆش دانیشتوون))

نینا: هەر دڵپاکییەکەی لەوەیا نییە، لە پێرێوە خانوەکەشی کڕیوە، بەڵام چاوەڕوانی منی کردووە کێشەکەمان بکەوێ بەلایەکاو بیکا بە ناوی منەوە، جا ئەیوت من بە هۆی کێشەکەوە نەچووم بەلای خانووەکەیا، لە کوێ بیرم لای خانوو بوو هههه ئەشزانم درۆ ئەکا، چاوەڕوان بوو ئاشت بمەوەو بیکا بە ناومەوە.

(( سوکە پێکەنینی ئاکۆو گێلاس))

ئاکۆ: کچم نەتهێشتایە، پێت بووتایە من دوکان و خانوویەکم هەیە.

نینا: ئۆو چیکرد چیکرد مامە ئاکۆ؟! ئەیوت دەمێکە ئەو دیارییەم بۆ داناوی، وتی چیت ئەوێ ئەوەت بۆ ئەکەم، دوای گواستنەوە تەواو هیچ نامێنێ هههه.

گێلاس: بڕوا بکە ئەوەش ڕاست ناکا.

نینا: زۆر دڵنیام ڕاست ناکا هههه.

ئاکۆ: ئینجا ئێستا بۆ ئیشەکەت ئەڵێی چی؟ ئەگەڕێیتەوە بۆ ئۆفیسەکە.

نینا(( سوعبەت)): کاکە ئێستا مێردم هەیە، ئەبێ پرسی پێ بکەم.

(( پێکەنین))

گێلاس: یەعنی بۆ مەسەلەی ڕاسپاردەکەی ڕەحمەتیی دڵت باش بوو؟

نینا: بۆ شووکردنەکەم خێرێکی گەورەم بۆ کردو ئاسوودە بووم، بۆ ئەمەشیان خێرێکیتر ئەکەم، ناتوانم لە کونی ژوورەوەیا بژیم، ژیان دوای ئەوانیش بەردەوامە.

ئاکۆ: ئافەرین جوانترین بیرکردنەوەیە.

ئاكۆ: ئەوان باوەڕیان بە جیاوازیی ژن و پیاو نییە، كچ و كوڕیان وەک یەک ئیش ئەكەن، دایكیان بەو تەمەنەشەوە لە ئیش نەوەستاوەو ئەڵێ هێشتا ئەوەڵمە هههه..
نینا: پێی باشە، منیش بچمە سەر ئیشێكی گەورەو سەرەتا لای خۆیەوە دەست پێ بكەم.

ئاكۆ: ئەها ساختەچی، ئیشت بنیادناوە، بۆیە وا ئەڵێی.

نینا: دەی جارێ وا ئێوەش تیرۆژتان بەدەستەوەیە، دوای ئەویش خوا كەریمە.

گێلاس: لەوەناچێ تیرۆژ دوو هەفتەیتر بەردەوام بێ.. بۆنی ڕۆشتنی ئەكەم.

نینا: ئەویش شوو ئەكا؟

گێلاس: یا شووە یا ئیشی گەورە، ئەقڵم وای ئەبڕێ.

Cut

دیمەنی – ٩٩٠ – ش/ د – سەری فەرعێک:

(( شەنیا بە سەیارەیەکی کیا یان یارس یان تیدایەکەوە دێت و لە پشت سەیارەیەکی مارۆنییەوە ئەوەستێت.. کەمێک تاریکیی هەیە بە جۆرێک دەموچاو نەناسرێتەوە، شۆفێری سەیارەی پێشەوە دێتە بەردەمی.. شەنیا دیقەتی ئەدا، تا نزیک ئەبێتەوە.. ))

شەنیا (( زۆر حەپەساو)): ئەوە تۆ نسێیت؟!!!!!!!!!!!

# (( ئەڵقەی چل و هەشت))

ڕاماڵ: بۆ پارەکە بە تۆیە؟؟؟؟؟؟

شەنیا: ناونیشانم بەرێ.

ڕاماڵ: کاک ڕەمزی وتی سکەیە.

شەنیا: لە سنوقەکەدایە بیبە، جانتای گەورەیە.

ڕاماڵ: تۆ لە کەیەوە هاتوویتە ڕیزەوە؟

شەنیا: کاتی قسە نییە، ئەمە ئیشە، پارەکەم هێناوە بیبەو بڕۆ، با تووش نەبین.

(( شەنیا لای خۆیەوە سندوقەکەی کردەوەو ڕاماڵ جانتاکەی دەرهێناو سنوقی داخستەوە، شەنیا پێی لێناو دەرچوو))

Cut

دیمەنی – ٩٩١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٩٩٨ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان و ڕەمزی))

ڕەمزی: شەوانە ئەزانم سەعات چەند لە ماڵی نارەوەن دەرئەچێ و ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی (( تەماشای سەعات ئەکا)) جارێ سەعاتێکی ماوە، فریای ئەکەوم.

دیدەوان: بەڵام وریا بن وەک ئەو کرمانجە سەر بە دام و دەزگای دەوڵەت نەبێ کە باستان کرد!

ڕەمزی: نەبابە، ئەم هەر خوێنەوارییەکی ئەوتۆشی نییە، جگە لەوەش ئەو کاتە چاودێریی زۆر باشمان کرد، بەهۆی نارەوەنەوە هەر زۆر هاوسۆز بوو لەگەڵ دارەوانا، تەنانەت پێکەوە سەردانیشیان کردبوو پێش لە سێدارەدانی.

دیدەوان: یەعنی تۆ پێتوایە بەهۆی خدرەوە نارەوەنیش دێتە پێشەوە؟

ڕەمزی: ئەوەیان نازانم، چونکە خدر بەڕاستی ئەیەوێ نارەوەن بپارێزێ، ئەزانم زۆری خۆش ئەوێ.. من ئەمشەو بە ڕێگەی خۆم لێی ئەچمە پێشەوە، با بزانین ئەو چۆن دێتە پێشەوە. (( پێکێ ویسکی لە سەلاجە دەرئەهێنێ و هەڵیئەدا))

دیدەوان: ئەو ویسکییە بۆ؟ تۆ بۆ ئیشێکی هەستیار ئەچی.

ڕەمزی: ئەو پێکە لە بەرنامەی ئیشەکەدایە.. ئەبێ بۆنی دەمم بکاو بزانێ خواردوومەتەوە.

دیدەوان: زۆر باشە بۆم باسکە چی ئەکەی؟

Cut

دیمەنی – ٩٩٢ – ش / ن – ماڵی زوبێر:

(( چیمەن و سەلواو مناڵەکە لە دیمەنەکەدان، زوبێر دێتەوەو سەلوا ڕائەکا بەرەوپیریی ئەچێت و چاکەتەکەی لێوەرئەگرێت و هەڵیئەوسێ و بەخێر هاتنەوەو سڵاو))

زوبێر: ڕێژوان نەهاتۆتەوە؟

سەلوا: فێری نادی بووە، شەوانە درەنگ ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆمان و خپ لێی ئەخەوێ.

زوبێر: وەڵا هەر ئەم بەزمەمان مابوو؟! نادیییییی!!!

چیمەن: باوکە قسەیەکی لەگەڵا بکە.

زوبێر: خۆ مناڵ نییە قسەی چی؟ ئەبێ بە ڕێگەیەکیتر چارەسەریکەم.. کێشە نییە ئەوەش چارەسەر ئەکەین.

سەلوا: هەرچەند خەریکە باش بێت، بەس جارێ ماویەتی.

زوبێر: ئەوەش چارەسەر ئەبێ کچم، خەفەتی لێ مەخۆ.. لە جارانیش باشتر ئەبێ.

چیمەن: ئەی خۆت لەگەڵ دادە نیگارا چیت کرد؟

زوبێر: ئەوە ئامادەیە، چاوەڕوانم کچەکەی بەختی بکرێتەوەو بڕوا بە ڕێی خۆیەوە.

سەلوا: جا وازوو ئەڕوا؟ خۆ ناکرێ تۆش هەر چاوەڕوان بیت؟

زوبێر: شتێک شک ئەبەم، ڕەنگە ئامۆ ببێ بە زاوام.

چیمەن: ئامۆی نارەوەن؟

زوبێر: ئا.. کەمێک لێک نزیکن و بە یەکتر ئەکرێنەوە.. ئەمەوێ خۆیان شتێک بدرکێنن و ئەوە بەرێکەین.. بەڕاستی لایەق بە یەکترن، زۆر باشن هەردووکیان.

چیمەن: ڕەنگە ئامۆ نەتوانێ لای تۆ هیچ بدرکێنێ، بە هۆی جیاوازیی تەمەنتانەوە.

زوبێر: ئۆووو نا.. ئێمە لەسەر بنچینەی ڕێز پەیوەندیمان چنیوە.. بەڕاستی هیچی شاراوەمان نییە.

سەلوا: نالێ حەزی لێکردووە یان نا؟

زوبێر: بە حەز لێکردن نا.. ئەڵێ هەستێکی زۆر تایبەتم بۆی هەیە، بەبینینی تەواو ئەکرێمەوە، بەڵام جارێ هیچ هەستێکی عاشقانەم نییە.

چیمەن: وایە جارێ زووە، ئامۆش سەنگینە، دیارە زوو خۆی نادابەدەستەوە.

زوبێر: جا ڕۆڵە ئەوە کەی خۆ بەدەستەوەدانە، ئەوە تێکەڵ بوونێکی سروشتیی دوو مرۆڤە بە هەڵبژادەو ڕەزای خۆیان.

Cut

دیمەنی – ٩٩٣ – ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( خدرو تریفەو نارەوەن و ئاوا دانیشتوون))

خدر: هەموو شتێک سەرەتا کەمێک بارگرانیی هەیەو قورس دەرئەکەوێ، دوایی هەموو شتێک نۆرماڵ ئەبێتەوە، ڕایەین لەگەڵیا.. (( بۆ تریفە)) کە هەڵشۆ گیرا بەستەزمانە خەریک بوو خۆی ئەکوشت.. ئێستا لەخوا ئەپاڕێتەوە قەت دەرەوە نەبینێتەوە.

تریفە: باوەڕ بکە لەگەڵ منا خراپییەکەی هەر لەوەیا نەبوو.. من خوا ڕەحمی پێکردم ئاوا نەجاتم ئەبێ لە دەستی.

ئاوا: کچێ ئێمە هەر سەیرێکی ناوچاوی پیاو بکەین ئەزانین چی لە بارایە، تازە ڕۆشت، بەس لەمەودوا بە قسەی ئێمە بکەی باشترە ڕوحەکەم، ئێمە لە ناو پیاواندایین و ئەزانین چی ئەگوزەرێ.

تریفە: وایە.. ئەبووایە بە تایبەت بە قسەی تۆم بکردایە.

نارەوەن: لەو بڕوایەدام ئیتر کێشەو بەڵا تۆزێک لێمان دوور بکەوێتەوەو بە ئارامیی سەرکزکەین و ئیشی خۆمان بکەین.

خدر(( هەڵئەسێ)): بەو هیوایە.. لەوباوەڕەدام لەمەودوا هەموو بمانپەرژێتە سەرئیش و پشوویەک بدەین.

نارەوەن: دە جارێ زوو بووا!

خدر: نا ئیتر کاتی ڕۆشتنە.

ئاوا: کاک حمەخدر لە دەقەی خۆیا هەڵئەسێ، ئیتر نازانم بەردەوام چاوی لەسەر سەعاتەکەیەتی، یان خۆی تەوقیت کردووە لەسەر ئەوکاتە هههههە.

خدر(( بەسوعبەتەوە خۆی ئەنوشتێنێتەوەو دەست لەسەر شانی ئاوا ئەدا)): خۆم تەوقیت کردووە هههههە.

(( ڕۆشتن و بەڕێکردن)) ـــــــــ تابع ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ٩٩٤ – متبوع - ش/د – کۆڵانی ماڵی نارەوەن:

(( لە دوورەوە دیارە حەمەخدر لە ماڵی نارەوەن دێتە دەرەوەو نارەوەن و تریفەو ئاوا خواحافیزیی ئەکەن، دەرئەچێت و ماڵی نارەوەن ئەچنە ژوورەوە.. پاش کەمێک ڕەمزیی وەستاوەو دەستی لێ ڕائەگرێت.. هەر لەناو سەیارەکەوە خدر فەرمووی لێ ئەکات))

ڕەمزیی: ببورە برا بەم ناوەختە ڕامگرتی، ڕاستیەکەی پێویستیم بە چەتاڵێک هەبوو و سەیارەیەکیش نەهات تا داوای هاوکاریی لێ بکەم، ئەگەر بفەرموویت لەو کۆڵانەی ئەودیووە، چەتاڵێکی بکەین، یارمەتیی هەیە؟

خدر: بەسەرچاو جا ئەوە چییە؟ پاتریەکەت چەند ئەمپێرە؟

ڕەمزی: ٦٠.

خدر: فەرموو سەرکەوە لە خزمەتتایە.

(( ڕەمزی سەرئەکەوێت و ئەڕۆن))

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ٩٩٥ – متبوع – ش/ د – ناو سەیارەی خدر- کۆلانێک:

(( سەیارەکە وەستاوەو خدرو ڕەمزی تیایە))

ڕەمزی: بەڵێ کاک حەمەخدر ئەوەندەم لەسەر تۆ زانیوە، ئەویش دوای ئەوەی بەدواداچوونم بۆ زۆرکەس کردووە.. جەنابتم چووی بەدڵاو بەڕاستی خۆشت ئەزانی لەم ڕۆژەدا متمانە هەر نەماوەو کەسیش نایەوێ پارەی خۆی بدا بە ئاوا.

خدر(( بزە)): ئەی سەیر نییە بەمجۆرە بێیتە سەر ڕێگەم؟ بە تایبەت کە شوێن و ڕێم ئەزانی؟!

ڕەمزی: پێم خۆش نەبوو لەبەردەمی ئەو ژنەدا باسێکی وات لەگەڵا بکەم.. ئەگەر شێوەی یەکتر بینینەکەت لا پەسەند نییە داوای لێبوردن ئەکەم و وابزانە هەر یەکتریشمان نەبینیوە.

خدر: من تێئەگەم، زۆرجار خەڵکانێک بیر لەو جۆرە یەکتر بینینە ئەکەنەوە.. بەڵام بۆ کەسێک خاوەنی سەرمایە بێ و بیەوێ سەرمایەکەی وەگەڕبخا.. نازانم بۆ ئەم جۆرە بینینە پۆلیسییەم لا پەسەند نییە.

ڕەمزی: یەعنی بێ هیوات کردم؟

خدر: ئەتوانین بە شێوەیەکی شەرەفمەندانەتر یەک ببینین، بەڵێ بێ هیوابی باشترە، بەڕاستیی هەهە من تاقەتی ئیشم نییە بۆ کەسی بکەم.

ڕەمزی: سبەینێ بێمە نوسینگەکەتان بەو مەرجەی باسەکەمان تایبەت بێت و ئەو ژنە ئاگادار نەبێ.

خدر: ئەزانی کاک.... ناوت چی بوو؟

ڕەمزی: ڕەمزی.

خدر: کاک ڕەمزی سەرمایە بەگەڕخستن ئاوا ناکرێ لەڕێوە مەرجم بەسەرا بسەپێنی، کە هیچ شتێک نازانم.. بۆیە ببورە، ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە وا تێبگەم ئەم ئیشەی تۆ

باسی ئەکەی، شتی تری لە پشتەوەیە، نەک کاسبییەکی ڕوون و دیار، مەبەستم ئەوەیە هەروەک داوای چەتاڵکردنەکە وایە.. هیچ ئامادەییم تیا نییە ببورە.

ڕەمزی: قسەکەت تەواوە.. منیش بە خۆڕایی بەوجۆرە نەهاتوومە سەرڕێت، هەڵبەت ئیشێکم پێتە هەر بە تۆ ئەکرێ، بە چەندیش ئەوەم بۆ ئەکەی لە خزمەتتام.. ئەزانم ئێرە جێی قسە نییەو ئەمە تەنها یەکتر ناسینێکی سەرەتایی بوو.

خدر: وایە، لە سروشتی ئیشەکەشت ئەچێ، پۆلیسیە.. چونکە یەکتر ناسین بەمجۆرە نابێ.

ڕەمزی: شوێن و کاتەکەمان دەلالەتی ئەوەت ئەداتێ ئەزانم.. هەر ئەوەش مەبەستی هەڵبژاردنەکەم بوو بۆ ئێرە.

خدر: کەواتە پەیوەندیی بەماڵی نارەوەن خانیشەوە هەیە؟

ڕەمزی: تۆ پیاوێکی وریایت و لەخۆڕا نەموت ئیشەکە تەنها بە تۆ ئەکرێ (( لەگیرفانی کارتێک دەرئەهێنێ و ئەیدا بە خدر)) ئەمەش ناو و ژمارەی تەلەفونم ئەگەر بەیانی تەلەفونت کرد، شوێنێک بە دڵی تۆ دیاری ئەکەین.

خدر: ئەمە تەنها ناوی خۆت و ژمارەکەیە.. کەواتە ناوەکەشت خوازراوە.

ڕەمزی: ئەوەت بە چیا زانی؟

خدر: ئەی نە ناوی باوک و باپیرو نە شوێنی کارو نە ئیشوکارت، هیچی تیا نییە.

ڕەمزی(( دەرگا ئەکاتەوە دابەزێ)): ئەوکارتە، تەنها یەک دانەیەو بۆ تۆش چاپکراوە، ئەوەیانت نەزانی.

خدر: لەوە ئاشکراترە بیڵێم هەهە.

(( ڕەمزی دائەبەزێت و ئەڕوات.. خدریش ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ٩٩٦ - ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهەمان شێوەی تحقیقەکانی پێشووی سەردار، ئامادەبوو: بەهێز، ئاری، مفەوەز، سەردار))

بەهێز: وردەکاریی زیاترم بدەرێ.

سەردار: ئاگاداری وردەکاریی ئیشەکەی نەبووم.. ئیشی من تەنها لێکێشانەوەی پارەوپول بوو لەو دۆست و ناسیاوانەی پشتیان بە شارەزایی ئەبەست بۆ ئیش و کارەکانیان، چەندم بتوانیایە بڕێکی زۆرم لە پارەکانیان ئەکردە جیاوازیی.

بەهێز: چ جۆرە جیاوازییەک، مەبەستت دزی لێکردن بوو؟

سەردار: بەڵێ لە کۆتاییدا هەر دزیی بوو، چونکە من لە نێوان نرخە ڕاستەقینەکەو ئەو نرخەی ئەمدانێ، جیاوازیم بۆ دروست ئەکردن.. بۆ نمونە ئەم مێزە بایی ٥٠ دۆلار بووایە من سەدو سەدو پەنجام لەسەریان حساب ئەکردو نەمئەهێشت پێی بزانن.. لە زۆرترین باردا پێیان نەئەزانی و منیش بەوە ئەژیام.

بەهێز: مەبەستەکەم دارەوانە.. چۆن فێری کوشتن و دزیی و چەتەیی کردی؟

سەردار: لەگەڵ دارەوانا پێکەوە گەشەمان بە گروپەکە دا.. ڕاستییەکەی کە ئەو چالاک بوو و شتەکان بەدەست خۆیەوە بوو، پێویستیی بە من نەبوو، ئەوسا هەریەکەو ناوێکی لێ نایین.. بۆ نمونە بە منی ئەوت حمە فلتەران، کە تا ئێستاش لای زوبێری هاوڕێم و زۆر کەسیتر وا ناسراوم.

ببەهێز: زوبێریش لەگەڵتانە؟

سەردار: نەخێر.. زوبێر بەهۆی زۆر خوێندنەوەو ڕۆشنبیرییەکەیەوە، لای من و دارەوان بە بێراڵێ ناومان ئەهێنا، ئەو خۆیشی نەیئەزانی مەبەستمان لە خۆیەتی.

بەهێز: بێراڵێ ناوی نهێنی زوبێر بوو لای ئێوە؟

سەردار(( پێکەنین)): نا.. بێراڵێ کورتکراوەی زوبێر زۆر ئەڵێ بوو، پیتی " زو" مان لە زوبێر کردبۆوە، هەر " بێر" مان هێشتبۆوە.. لە " زۆر ئەڵێ"ش تەنها " الّێ" مان هێشتەوە، بەوجۆرە بوو بە بێراڵێ هههە.... جارێکیان دارەوان یادی بەخێر:

**بۆ فلاشباک:**

_____ گەڕانەوەی هەیە _____________ Cut _____________________

**فلاشباک:**

دیمەنی – ٩٩٧ – ڕ/ن – ماڵی حمە فلتەران:

(( زوبێرو سەردارو دارەوان))

سەردار: نازانم ئەو تۆپە بۆ وای لێهات بەدەست ئەو کابرایەوە؟ من وتم دۆڕا، یاریزانەکەی تریش هەروای زانی، چونکە بە ڕەکتەکەی بە لایەکی تردا هەڵیدا، کەچی ڕێک گەڕایەوە سەر مێزەکەو بردییەوە، هەر زۆر سەیر بوو.

زوبێر: حمە فلتەران ئەوە شتێکی ئاساییەو بە ڕاهێنان ئەکرێ.

سەردار: کورە ئاسایی چی؟ وەڵا کەس ناتوانێ ئەوە بکا.

زوبێر: نەبابە، ئەوە پەیوەندیی بە دیاردەی ماگنۆسەوە هەیە، گۆستاف ماگنۆس زانایەکی فیزیایی بوو ئەو دیاردەیەی دۆزییەوە، هەر تۆپی تێنس نا، هەموو گۆیەکی خڕ ئەکرێ بەو جۆرە بخولێتەوە، ئەو کاتە ئاڕاستەی هەوا لە سەرو ژێری ئەگۆڕێ و پێچەوانە ئەبنەوە، بەو جۆرە ئەو شتە خڕە هەم خێراتر ئەبێت و هەم ڕێڕەوەیش ئەگۆڕێ بەو جۆرەی ئەخوازرێ.. هێزێکی زۆر زۆر پەیائەکا.. ئەوە لە دروستکردنی فڕۆکەشدا بەکارئەهێنرێ.

دارەوان: ئێمە ئەو شتانە نازانین، ئەوەنە ئەزانین بردییەوەو تەواو.

زوبێر: ئای نابینن یاریزانەکانی تۆپی پێش هەندێکیان وا ئەکەن؟ ئەوە ڕاهێنانی زۆری ئەوێ.

دارەوان: ئەوە بابەت نییە، کورە دوێنێ لەگەڵ حمە فلتەران چووینە لای پەنچەرچییەک، بێڕاڵییەکی لێ بوو، برادەریشمانە، هەر مێشکی بردین.

زوبێر: لە هەرکەس وەڕس بوون بە ڕاشکاویی پێی بڵێن، ئەگینا هەروا ئازاریشتان ئەداو هەر ئەبێ تەحەمولیشی بکەن.(( دارەوان پێی سەیر ئەبێ))

**فلاشباک تەواو:** ______________________ Cut ______________

دیمەنی – ٩٩٨ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٩٩٦ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( سەردار پێ ئەکەنێ و بە پێکەنینەوە کۆتایی قسەکەی ئەڵێ ))

سەردار: جا دارەوان وایزانی تێگەیشتووە...............

بەهێز(( قسەکەی پێ ئەبڕێ)): تۆ لە لێکۆڵینەوەدایت، کاتی سەرگوزشتە گێڕانەوە نییە.. پرسیاری من سەبارەت بە بوونی تۆ بوو بە میر.. لەسەروەختی دارەوانیشدا هەر پیاو کوژ بوویت؟

سەردار: نەخێر ئەو کاتەی دارەوان پاشا بوو، بۆ من خێرو بەرەکەت بوو.. نەکەسم ئەخستە ڕیزەوەو نەهیچم ئەکردو دارەوانیش بە بڕی گەورە بەسەری ئەکردمەوە.. نەخێر من هیچم نەئەکرد.

بەهێز: ئەی چۆن دوایی یەکسەر بووی بە پیاوکوژ؟

سەردار: دارەوان تەنها ڕێگای بۆ ڕۆشن ئەکردمەوەو هەموو شتێکی فێرکردبووم.. لە پێناوی پارەیا، لە پێناوی بەدەستهێنانی ئەو شتەیدا کە دڵت ئەیخوازێ، هەموو شتێک بکە، بکوژە بفرێنە خەڵک بخە سواڵ.. هەموو شتێ بکە، بۆ خۆت بژی.. ئەمە ئامۆژگارییەکانی بوو.

بەهێز: دیارە هموو شتێکت بە قسە کردووە؟

سەردار: بە جۆرێک کە حەزمکرد دارەوان تیاچوو.. ئۆتۆماتیکی پەیوەندییان پێوە کردمەوەو (( شانازییکردن )) ڕاستەوخۆ بووم بە میری گەورە.

بەهێز: کێ پەیوەندیی پێوە کردیتەوە؟

سەردار: ئەوانەی لای ئێوە گیراون.

بەهێز: کێیتر لەوانەی لەدەرەوەن؟

سەردار: کەس نەماوە، هەموو گیران.. گەورەم با ئەمڕۆ بەس بێ، زۆر ماندووت کردم، کاتێکیتر لە خزمەتدا ئەبم.

بەهێز: لای دادوەر چڕتر قسە ئەکەیت و خۆت کۆکەرەوە، قسە زیادەکان فڕێدەو ئەوەی پێویستە ئەیلێیت و ئەویش لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی هەیە.

سەردار: پێمخۆشە زووتر هەڵمواسن و ئەم هەموو یاداشتکردنە زیادەیە.

بەهێز: کێ ئەڵێ هەڵئەواسرێی؟ ئەوەیان دادگای بابەت ئەیزانێ.

(( دیالۆگ لە میوتیداو کردنە دەرەوەی سەردار بە دەستی پۆلیسەکەی بەردەرگا ))

Cut

دیمەنی – ٩٩٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا و ڕەوەز بە پێوەن، ئاوا بەسەر پێوە تدقیقی هەندێ ژمارە ئەکا))

ئاوا: ئەی کوا بارە تایتی تیا نییە؟

ڕەوەز: تایتمان نەبووە.

ئاوا: ئەی ئەڵێن دوو کارتۆنیان لێرە جێماوەو خۆت بۆت بردوونەتەوە.

ڕەوەز: بار نەبوو، هەر دوو کارتۆن بوو، برادەرێکم وتی لەو دەوروبەرەی خۆتان بۆم بکڕە، نەک تا ئەگەم دوکان و بازاڕ نەمابێ.

ئاوا: ئەههها تێگەیشتم، بەڵام با هەموو بارەکان مام لەتیف بیپشکنێ ڕەوەز گیان، بۆ هیچ بارێک ڕێگیریی مەکە.. ئەوە بڕیاری منە.

ڕەوەز: ئەمرەکەی.

ئاوا: زۆر دەستت خۆش بێ، ئەم ئیشەم بەدڵە.. بەم شێوەیە زۆر ڕوونە.

ڕەوەز: سوپاس.

ئاوا: ئەمڕۆ ئیشێکی ئەوتۆمان نییە.. ئەتوانی پشوو بدەیت و منیش ڕەنگە دایخەم.. ئەگەر شتێکیش بوو زۆر پێویست بوو، بانگت ئەکەمەوە.

ڕەوەز: کلیلم بۆ جێ ناهێڵیت؟

ئاوا: نا، پێویست ناکا، وەک وتم ئەگەر شتێک هەبوو پێشتر خۆم لێرە ئەبم.

ڕەوەز: بەڵێ باشە.. خواحافیز.

ئاوا(( هەر سەری داخستووە)): خواحافیز.

گەڕانەوەی هەیە ———— Cut ————

دیمەنی – ۱۰۰۰ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر - ژووری زوبێر:

(( زوبێر هەڵامەتی هەیەو ڕێژوان/پەنجەرەی ژوورەکە پلاستیکی صاجییە))

زوبێر: با سەلوا پێیوتین شەوانە بەسەرخۆشیی درەنگ دێتەوە.. ئەمشەو حەزم ئەکرد بێم بۆلات بەڵام نەمزانی لە چ نادییەکی.

ڕێژوان: جا خۆ تۆ ناخۆیتەوە باوکە.

زوبێر: دەی خۆ تۆش نەتئەخواردەوە، ئەوەتا فێر بووی.

ڕێژوان: بۆ من جیاوازە، کێشەیەکی بچووکم هەیە تا تێی ئەپەڕێنم و باش ئەبم.

زوبێر: کوڕم باوکت ئاگای لە ململانێی نەوەکان و گرێی ئۆدیب و ئەلکتراو ڕۆژهەڵاتیی بوون و داب و نەریتە نەگۆڕەکانیشی هەیە.. ئەمانە کاریگەرە دەروونییەکانن.. بۆ نموونە، گەر تۆ لە هەرزەکاریشتەوە بتخواردایەتەوە، من بەلامەوە ئاسایی بوو، ئەوە دژ بە داب و نەریتی باوک وەستانەوەیە بەلانی منەوە، زۆر ئاساییە بە ململانێی نەوەکانی تێئەگەیشتم، لەبەرئەوەی بە پێچەوانەی من منەوە ڕەفتارت ئەکردو ئەوەت پێخۆشتر بوو..

ڕێژوان: بەڵام ئێمە هەر لە ژێر ڕکێفی خۆتابووین باوکە، ئەم حاڵەتەی منیش کاتییەو تێئەپەڕێ.

زوبێر: ئەگەر قسەکانم بۆنی گلەیی لێ هاتبێ، ببورە ڕێژوان گیان، تازە ئێمە گەیشتووینەتە تەمەنێک ڕەنگە لە دارشتنی گوزارشتدا سەرکەوتوو نەبین، بەڵام زیاتر ڕوونکردنەوەمان پێخۆشە.

ڕێژوان ناباوە گیان، ئێمە ئەو سیفەتەی تۆمان زۆر لاپەسەندو بەرزە، کە گلەیی ناکەیت و واتلێکردووین لێپرسینەوەشمان لەگەڵ نەکەی، نا.. ئەبەد بۆنی گلەیی لێنەهات، بەڵام ببورە من کەمێک ئەعصابم گەرمە.

زوبێر: جا ئەو تەمەنەی تۆو بەرەوخوار، جاروبار دووچاری خەمۆکییەکی بێبنەماو بێ هۆکاریش ئەبنەوە، من دەمێکە ئەمەم پێوتووی، نابێ هیچ هەڵویستێکی ناجۆری لەسەر بنیات بنێی، چونکە هیچ بنەڕەتێکی نییە، بەڵام بۆ نمونە گەر بەهۆی کاریگەرێتییەکەوە بێت لە دەرەوەی ئیرادەی خۆتەوە، وەک ئەوەی عەشقێکت لەسەر زەوییەکی فشەڵ هەڵچنیبێ و ئێستا ڕوخابێت، ئەوا پێویستی بە چاوخشاندنەوەیەکی ورد هەیە بە خۆتا.. نابێ بهێڵی بەسەرتا تێپەڕێ.

ڕێژوان: نا باوە گیان کێشەیەکی تایبەتییەو ئەوەندە بێبەهایە، پێویست ناکا سەری جەنابتی پێوە بیەشێنم.

گەڕانەوەی هەیە ــــــــــــ Cut ــــــــــــ

دیمەنی – ١٠٠١ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن دانیشتوون))

خدر: باشترە بچین بەلایەکا، نەک دەرکەوێ.

نارەوەن: ئەی تۆ ناتەوێ لێی تێبگەیت و بزانی چی ئەوێ؟

خدر: بە پەرۆشەوە.

نارەوەن: ئەی بۆ چاوەڕێی ناکەی؟ بەڵکو بێت.

خدر: بۆ ئەوەی نەزانێ قسەیم بە هەند وەرگرتووە، بۆنی دەمی ڕۆژە ڕێیەک ئەڕۆشت.

نارەوەن: تێگەیشتم.. ئەی بچین بۆ کوێ؟

خدر: ئەرزی خوا زۆرە هههه.

(( هەڵئەسن و ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٠٠٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ٩٩٩ –کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا وەستاوەو پاش کەمێک مام لەتیف وەک بەدزییەوە بێت))

لەتیف: ڕۆشت.

ئاوا: زۆر باشە.. شەو کابرای کامێرەکە بانگکەو پێکەوە کامێرەکان دانێن.. پێموتووە بچووکترینم بۆ دابنێ و شوێنی ون بێ و وایەرومایەریشی بەدەرەوە نەبێت.. ئەوە بە تۆ ئەسپێرم مام لەتیف، نابێ دیار بن.

لەتیف: خەمت نەبێ، هەرچی بە من بکرێ ئەیکەم.. ئەی بۆ دەری ناکەیت و خۆت لەسەرێشەی بە دوورخەیتەوە؟

ئاوا: ڕاستییەکەی لە ڕووم نایەت، خۆم وتم وەرە ئێرە.. ئەگەر شتێکم لێ بینی ئەوسا ئاسان ئەبێ.

لەتیف: بەدڵی خۆت.. ئێستا دایخەین و بڕۆین؟

ئاوا: وەک ئەوەی نەشگەڕێیتەوە، ڕێک بەرەو ماڵەوە.. (( کلیلی ئەداتێ)) ئەوەش کلیل.

Cut

دیمەنی – ١٠٠٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٠٠ – ڕ/ ن – نەخۆشخانەی زوبێر:

(( زوبێر هەڵامەت و ڕێژوان))

زوبێر: شتێک ئاگادارم وایە، دڵنیا هەر کاری لەوەدا کردووە (( ڕێژوان ئەحەپەسێ و واق وڕماو)) سەر لە پیاوی خێزاندار بشێوێنێ، خۆی پێشتر کەسێکی خێزاندار فێڵی لێکردووە.

ڕێژوان: باوکاااا.

زوبێر: گیانی باوکە؟

ڕێژوان: تۆ ئەمە چۆن ئەزانی؟ سەلوا ئاگادارە؟

زوبێر: سەلوا بۆ ئاگادار بێ؟ با هەروا بزانێ تۆ بیانووی پێ ئەگری، کە هەرواشە، بیانووت پێ ئەگرت.. ئەو ژنە زۆر واقیعییەو زۆریشی خۆش ئەوێی، دڵنیابە گەر بە ڕاشکاویی داوای لێبوردنی لێنەکەیت و دان بەهەڵەتدا نەنێی بۆ ئەو ماوەیەی زوڵمی زۆرت لێکرد.. ئەو ژنە دائەڕمێ و لە ژنێکی کلاسیکی زیاتری بۆ تۆ تیا نامێنێتەوە، ئیتر کەیفی خۆتە.

ڕێژوان: بەڵێ خەریکە وای لێ بێت.. ڕاستە ژنێکی باشە، بەڵام ...... (( بێدەنگ ئەبێ))

زوبێر: بەڵام پێت وایە دڵنیا جوانتر بێ هههههه، نا جوانتر نییە کوڕم، تەنها ئەوەندە هەیە بۆ تۆ تازەیە، پاش ماوەیەکیتر ئەزانی ئەمیش جوان نییە... ئەوە بەرە بەرە بەرەو داوێن پیسیت ئەبات و ئیتر هیچ کەسێک بە بەردەوامیی لای تۆ جوان نامێنێتەوە.

ڕێژوان: سوپاس باوکە بۆ هەموو شتێک، کە لای کەسیش نەتدرکاندووە.

زوبێر: ئەوە شتێکە پێویستیی بە خۆچاککردنی تۆیە، نەک سوپاس کردنی من.

ڕێژوان: باوکە ئەتوانم بپرسم چۆن ئەمەت زانی؟

زوبێر: نا... تۆ ئەزانی من قەت سەرچاوە ناڵێم بۆ هیچ زانیارییەکم.

ڕێژوان: تەنها پرسیارێک.. دڵنیات بینیوە؟

زوبێر: بەڵێ بە بێ ئەوەی هیچ شتێک بزانێ سەبارەت بە پەیوەندیی باوک و فرزەندیی من تۆ.

ڕێژوان: داوای لێبوردن کردن لە سەلوا پێویستە، یان تەنها خۆچاککردنی من؟

زوبێر: ئەبێ متمانەی بۆ بگێڕیتەوە، داوای لێبوردنی لێ بکەی سەرەتایەکی جوانە.. کەواتە سەرەتایەکی پێویستە.

ڕێژوان: قورس نییە چیرۆکەکەشی بۆ باس بکەم؟

زوبێر: بە پێچەوانەوە، نەک هەر قورس بەڵکو کارەساتە بیزانێ.

ڕێژوان: یارمەتی هەیە ئێستا ئەوە بکەم؟

زوبێر: کاتت لەبەردەمدایە، ئەوە سیفاتی کەسێتیی هەڵچووە، نابێ ئەو ساتەی دێت بە خەیاڵتا هەر ئەو ساتەش ئەوە بکەی.. .. هێمنبە جارێ، هەڵیگرە بۆ گەڕانەوەت.

ڕێژوان: بەڵێ باشە.. بەڵام ئەوەی سەبارەت بە دڵنیا وتت، خۆم بە ڕوونیی لێم بینی.

زوبێر: بیری خۆتی بەرەوە، هەر تۆ نا، زۆرێکی بەو دەردەی تۆ بردووە، ڕەنگە تا ئێستاش وابزانی ئەگەڕێتەوە.. چاک دڵنیابە، ئیشی خۆر مەیسەر کردو ئیتر کاری بە تۆ نەماوە.

ڕێژوان: بەڵێ ڕاستە.. زۆر سوپاس باوکە ئەچمەوە سەرئیشەکەم، بەرنامەش دائەنێم چی بکەم.

زوبێر: باشە گیان فەرموو.

(( چوونە دەرەوەی ڕێژوان))

Cut

دیمەنی – ١٠٠٤ – ڕ/ د – قاوەخانە:

(( تیرۆژو ڕاماڵ))

ڕاماڵ: خانووەکە بەسەرچاو.. لای ماڵی خۆشتانەوە هەر بەسەرچاو.. بەڵام کارگە سوودی نییە.. ئیشێکیترا!

تیرۆژ: نەمویست داوای شتی گەورە بکەم، ڕەنگە ببێتە بارگرانیی بۆ تۆ.

ڕاماڵ: خەمی هیچت نەبێ، داوای هەرچییەک ئەکەی بۆ تۆ بارگرانیی نییە، بە پێچەوانەوە خۆشحاڵم ئەکا.

تیرۆژ: زۆر سوپاس.. مایەی ئەوپەڕی خۆشحاڵیمە ڕاماڵ گیان.. ئێمە ڕێککەوتووین و هیچ شتێک نەما ڕێ لە هاتنە پێشەوەت بگرێ.

ڕاماڵ: با، ئەبێ دڵنیابم لەوەی ژنەکەم بە هۆی پارە بۆ خەرج کردنەوە خۆشی ئەوێم، یان بە دڵ؟

تیرۆژ: درۆت لەگەڵ ناکەم، سەرەتا هیچ هەستێکم نەبوو، تەنها بۆ ئەوە هاتم بڕێک پارەت لێوەربگرم و دواتریش بۆت بگێڕمەوە، ئەوەش بۆ ئەوەی جارێکیتر یارییەکی ئاوا بێهۆشانە لەگەڵ کەسیترا نەکەی.. بە کورتی بۆ سزادانت هاتم.

ڕاماڵ: بەڵێ شایستەی بووم.. بەڵام بە بینینت هەموو دنیای من گۆڕا، پێت سەیر نەبێ، نەک هەر واقم وڕما بە بینینت، بەڵکو بووی بە خولیاشم.. ئەی دواتر؟

تیرۆژ: دواتر شیرین بووی لە دڵما، بەدەست خۆم نەبوو، ئەهاتیە بەرچاوم، بەڵام هەستم بۆت نەبوو تەنها هۆگریی بوو.

ڕاماڵ: دواتر؟

تیرۆژ: کە پێشنیازی هاوسەرگیریت بۆ کردم، شڵەژام.. تاقیمکردیتەوە، تا بزانم جێی شەنیام بۆ گرتوویتەوە یان نا؟ تا دڵنیا بمەوە چاوت لەسەر شەنیا نەماوە.

ڕاماڵ: بەهیچ جۆرێک.. بەڕاستی ئەوت لە جیهانی مندا سڕیوەتەوە.

تیرۆژ: بەڵێ ئەمڕۆ دەرت خست کە ئەو قسەیەت ڕاست بوو.. لەگەڵ ڕازیی بوونت بە هەر مەرجێکما، تەزوویەک بە دڵما ئەگەڕا، هەستم ئەکرد ژیانی تیا ئەگەڕێ.

ڕامان: یەعنی تۆش عاشق بوویت؟

تیرۆژ: هەر جارێ نا.. بەڵام هەموو دەرگاکانی عەشقت واڵا کردووە.. ئەوە نزیکترین ئەگەری داهاتووی نزیکمە.

ڕاماڵ: بە ڕاستگۆییەکەت زۆر دڵخۆشت کردم.. بەڵام لای من لە سەرسامیی ئاسایی دەرچووە، ئێستا من بە دڵ خۆشم ئەوێی.

تیرۆژ: منیش خۆشم ئەوێی، بەڵام با ڕیالێیتر بین.

ڕاماڵ: ئەمشەو دایکم و یەک دووانێکیتر ئەنێرم.

تیرۆژ: بەخێر بێن سەرچاوم.

(( پێکەنین و دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ١٠٠٥ – ڕ/ د – سەر کورسییەک لە پارکێکا:

(( نارەوەن و خدر لەفە ئەخۆن))

نارەوەن: منیش شەنیا گرِودەوری داوم، هەست ئەکەم هەر پەیوەندیی بەو مەسەلەیەی تۆوە هەبێت.

خدر: ئەشێ وا بێ.

نارەوەن: باشە وا دوو هەفتەی تێپەڕاند، بۆ تێلی بۆ ناکەی؟

خدر: لەگەڵ نەقیب ڕاهۆزیشا قسەم کرد، ئەویش پێی باش بوو چاوەڕوانی خۆی بکەین، ئیتر ئەبێ بۆ ڕێگەیەکیتر بگەڕێ بمگاتێ.. بۆ ئێمە وا باشترە زووتر بیگەینێ، بەڵام ئەویش پشوو درێژیمان تاقی ئەکاتەوە، ئەزانێ ئەگەر پەلەیەک بکەم، مەبەستداره.. وا خۆم نیشان ئەدەم کە بیرم چۆتەوە لەبەرئەوەی وامزانیوە سەرخۆشە.

نارەوەن: ئەوەی شەنیاش هەرئەوەیە.. هەر پەیوەندیی بە مەسەلەکەی میر نیزامی چاوبزەوە هەیە هههە.

خدر: هەموو خۆیان ئاشکرا ئەکەن و دوو داماوی وەک من و تۆیان دەستکەوتووە بمانخەنە ئاگرەکەوەو تێمانەوە بگلێنن.

نارەوەن: ئەهـ .. ئەها چەند داماوین؟! هههە.

خدر: تیرۆژ وا زوو ناڕوا؟

نارەوەن: نا تیرۆژ ئەڵێ ناهێڵم پەلە بکا، با هەموو شتەکانی پێش گواستنەوە پێ بکەم. ههە.

خدر: وەڵا ئەوەی بۆ تیرۆژ لواوە بۆ کەس نالوێ، خۆیشی ئاقڵە ئەزانێ چۆن کاری خۆی بەڕێ ئەکا.

نارەوەن: کچی باوکیەتی باوکی.. دەرفەت بە فیڕۆ نادا.

Cut

دیمەنی – ١٠٠٦ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( تیرۆژو گێلاس))

گێلاس: وەڵا تۆ بڕۆی من مجرۆ ئەبم.. چی بکەم؟

تیرۆژ: هەرکاتێ چاپخانەکەم تەواو بوو ئەڕۆم، جارێ وا لە هێنانی کەرەستەکانە لە دەرەوە.. پێش ئەوەش یەکێ لە کارمەندەکانی خۆمت بۆ ڕائەسپێرم، ڕۆژانە سەردانت بکاو چیت هەیە بۆت بکا.

گێلاس: وا نابێ.. تۆ لێرەو نیناش لەماڵەوە ئیشەکەم فێرکەن و ئاواش وردەکاریی ئیشی ئازووقە هێنانەکەم تێبگەیەنێ، بەخوا ئەویش کە گواستیەوە ئیش بۆ من ناکا.. با خۆم فێری هەموو ئیشەکان بم، ئەمە بۆ من دەریناهێنێ، هەرکەس بێنم و بڕوا، نەبەخوا هەهە.

تیرۆژ: ماشەڵڵا ئۆفیسەکەت سەر بە ڕسقە هەههەه.

گێلاس: ئای وا شوکور هەمووتان ئەڕۆن، هەرئەوە ماوە دیاریش پەڵپم لێ بگرێ.. ئەک قوڕەکە بەسەرم، وەڵا مەگەر دایخەم هەهە

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ١٠٠٧ – ڕ/ د – کارگەی ڕاماڵ:

(( ڕاماڵ و سەرچڵ))

سەرچڵ: پارەکەش هەر خۆیان دابینیان کرد؟ ئەوانە کێن ئەوەنە دەسترۆشتوون؟

ڕاماڵ: باندن باند.. تۆ بڵێ کێ پارەکەی بۆ هێنام؟

سەرچڵ: کێ؟

ڕاماڵ: شەنیای کۆنە دەنک هههه.

سەرچڵ: بۆ ئەویش لەگەڵیانە؟ ئەهـ برا کە خەتەرن!

ڕاماڵ: کە متمانەی ئەو پارە زۆرەی پێ بکەن، هەڵبەت زۆر لە سەریشەوەیە.

سەرچڵ: کورە ڕاماڵ ئەم ئیشە بە کەڵک نایەت، لەم گۆبەنە خۆت ڕزگارکە، بەخوا هەر ڕۆژێک بێ تیائەچی، ئەو پارووە هی من و تۆ نییە.

ڕاماڵ: کاکە من بۆ نەسیحەت و فاڵگرتنەوە ئەمانەت بۆ باس ناکەم.. ئەوان بە زەبری هەڕەشەو کوشتن ڕایانکێشاومەتە لای خۆیان، هەر جموجۆڵێک بکەم، دووانیشیان تیا بچن سێیەمیان ئەمکوژێ.. حەز ئەکەم بژیم و ژنی خۆم بێنم توخوا لێمگەڕێ، ئەوە دوو وەجبەیەیان لێگیراوەو من سەلامەتم.

سەرچڵ: ئاخر تا سەر نابێ برا.

ڕاماڵ: من ئەم نهێنییانە بۆ تۆ باس ئەکەم، تا گەر خۆیان شتێکیان بەسەر هێنام، قەوم و قیلەم بزانن دوژمنم کێ بوو.. تکا ئەکەم هەروەک جاران بیپارێزە.. ئەوە ئیشی تۆیەو هیچیتر.. من هەموو متمانەم بە تۆ بەخشیوە سەرچڵ گیان.

سەرچڵ: ئەی کەسوکاریش ئەوکاتە پێم ئەڵێن، کە ئەم هەموو نهێنییەت ئەزانی، بۆچی پێشتر پێت نەوتووین؟

ڕاماڵ: جا تۆ گلاراوت گرتووە هەموو شتێک باس ئەکەی؟ بڵێ ڕۆژێک پێش کوشتنەکەی ناخۆشیی بووە لەگەڵ فلانا، بۆ نمونە.

سەرچڵ: بەوەی باشە خۆشت ئەزانی ئەکوژرێی.. یاخوا بگیرێیت و نەکوژرێی.

ڕامڵ: ئەک لالغاوەت شین بێتەوە باشە، بۆ هەر ئەبێ شتێکم بەسەربێ.

سەرچڵ: قسەی خۆت ئەکەمەوە.

(( دایالۆگ و سوعبەت))

Cut

دیمەنی – ١٠٠٨ – ڕ/ن - ماڵی ڕێژوان:

(( ڕێژوان دێتەوەو سەلوا بەرەو پیری ئەچێت))

سەلوا: ها گیان خێر بوو وا زوو هاتیەوە؟

ڕێژوان(( سوعبەت)): باوکم دەریکردم.

سەلوا: نا توخوا بەڕاست، ئەزانم باوکت شتی وا لەگەڵ تۆیا ناکا.

ڕێژوان: باشی ئەناسیت.. نەوەڵا بروسکم لێ ڕاسپارد، بۆ دوکانی مۆبایلەکە.. ڕازیی بوو و بانگی کردم، وردە ئامۆژگارییەکی باشی کردم لەسەر تۆو.....

سەلوا: ئەک قوربانی بم.... ئێ؟

ڕێژوان: ئەی وایە خۆ زەرەرت نییە، منیش بەڵێنم پێدا کە هەرگیز تێک ناچینەوە.. ئیتر وتی دەبچۆ بەلای ئیشی خۆتەوە.. ئاهـ کە دڵخۆش بووم، بە ڕاستی ئیشەکەم لای ئەو زۆر ناخۆش و بێزارکەر بوو.

سەلوا: دەی ماڵی ئاوا بێ و دەستی خۆش بێ.. منیش ماڵەوە کوشتمی.. زۆر خنکێنەر بوو.

ڕێژوان: کەواتە با بچم بگەڕێم بۆ شوێنێکی باش.

سەلوا: سوپاس کە زوو هاتییەوەو پێت وتم.

ڕیژوان(( بە پەلە ئەڕوا)): تۆ ڕوحەکەی.. بای.

سەلوا(( ڕێژوان دەرچووە)): بای گیان... ئۆهـ خوایە ئەمجارە تا سەر بێ.

Cut

دیمەنی – ١٠٠٩ – ڕ/د – بەر ڤێللایەک:

(( نینا سەرسوڕماو و ئاوا ))

ئاوا: وتت چی ڕوحەکەم؟

نینا: واو جا ئەمە چی لەسەر ئەوترێ؟ بۆ وات کردووە شتەپیس؟.. من ئەو هەمووە ئەهێنم؟

ئاوا: ئا سەد دۆلاری تریش ئەهێنی هاهاها.

نینا: ئەگەر تۆ هەر ئەوەشت بهێنایە، یەکێک بۆی ئەکڕیت.

ئاوا: کچێ من زۆر لەوە زیاتر ئەهێنم، ئەوەتا تۆم هێناوە، بەهای تۆ لەو نرخانەیا نییە دڵەکەم.

نینا: شێت! ئەی بۆ ئەمهێنیتە قسە؟ هەهە.

ئاوا: ئەی تۆزێ قسەم بۆ نەکەی چی دڵم ئاو ئەدا؟

نینا: قوربانت.. بەڵام گوێم لێبگرە، من هەمووتانم خۆش ئەوێ.

ئاوا: ئەک خوا نەیبڕێ، یەعنی لە ئێستاوە هەر خۆم نیم، خەڵکی تریشت زۆر خۆش ئەوێ.

نینا: مەبەستم ئەوە نییە شێت و وێت.. جوانترە دایک و خوشک و براکەشت ئاگادار بکەیتەوە، وەک ئەوەی هێشتا من نەمبینی بێ.

ئاوا: من درۆی وا ناکەم.. ڕاست و دروست پێیان ئەڵێم نینا بەدڵیەتی، ئەی ئێوە؟ ئەوانیش ئەڵێن ڤێللا ڤێللای نینایەو پیرۆزی بێت.. تەواو.

نینا: بە دڵی خۆت.. من وام پێ باشترە.

ئاوا: بەسەرچاو، ئەو درۆیەشت بۆ ئەکەم، وەستای درۆ.

نینا: کاممان؟ ئەفسەری پۆلیسی ئاداب؟ (( بێ تاقەت ئەبێ )) ئەی یادت بەخێر باوکە.

ئاوا: باشە کاتی شین دابەستنەوە نییە.. بابە خۆم درۆزن و درۆزانیشم.. تۆ لە ماوەی بووکێنییای کچێ، نابێ سەغڵەت بیت، ئەگینا دوایی منالّەکەت کەم ئەندام دەرئەچێ.

نینا: قەینا هەروەک باوکی شێت نەبێ، کێشەی کەمئەندامیم نییە.

ئاوا: خوا ئەکا لە دایکی ئەچێ، هیچم ناوێ.

نینا(( بەسوعبەتەوە ئانیشکی پیا ئەکێشێ)): ئەرێ کاکە تۆ ئەمڕۆ بۆ وا ڕووگیرم ئەکەی؟

ئاوا: لێت تێک نەچێ کاکت نیم هههە. بڕۆ با بچین کابرای نوسینگە بێنین و ناوەوە ببینین.

(( سواری سەیارە ئەبن و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٠١٠ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر - ژووری زوبێر:

(( شەنیاو نیگار دێنە ژوورەوە بۆ لای زوبێر، کە زوبێرو ئامۆو بروسک لە ژوورەوەن.. پاش سڵاو و بەخێرهاتن))

ئامۆ: دایکم چاوەڕێم ئەکا مامە زوبێر، زوو ئەگەڕێمەوە (( خواحافیزی هەمووان، جگە لە شەنیا ))

نیگار(( بۆ زوبێرو ئاماژەی بروسک ئەکا)): هەڵبەت ئەمە زاوازێڕینەیە؟! بەخێر بێیتەوە. سەفەری خۆشت کردبێ.

بروسک: زۆر سوپاس.. بەڵێ هەوم لە خزمەتدام.

زوبێر: ڕۆڵە ئەوان لە خزمەتتا بوون کاتێ چیمەن منداڵەکەی بوو، بە ڕاستی حەشرێکیان کردووە، چاکەیان بە من نادرێتەوە.. ئەوە نیگار خانەو ئەویش شەنیا خان.

(( دەربڕینی خۆشحاڵیی هەردوولا ))

بروسک: من ناوی جەنابتم بیستووە چەند میهرەبانی.

نیگار: هەرکەس لە زوبێر نزیک بێتەوە، ئەبێ میهرەبان بێ.. وەک تۆ.

بروسک: زۆر سوپاس گەورەیی خۆتە.

نیگار: ئەی نەخۆشییەکەت چۆنە زوبێر.. خۆ ئەم ماوەیە هەر بواری نەدای.

زوبێر: زۆر باشم نیگار گیان، ببورە دەرنەکەوتم و یەکی خستبووم، ڕۆژی وای تیابوو، هەر نەمئەتوانی بێمە ئێرەش، باش بوو بروسک هاتبۆوە لەگەڵ ئامۆ هەموو ئیشەکانیان تەواو کرد.

شەنیا: ئەی کاک ئامۆ دڵی بە ئیشەکە خۆشە؟

زوبێر: هەر مەپرسە.

شەنیا: دە لای خۆتان دامانمەزرێنن، من و نیگار خان.

زوبێر: نیگار خۆم دایئەمەزرێنم، تۆش خۆت لەگەڵ ئامۆ بگونجێنەو با داتمەزرێنێ هههه

(( پێکەنین ))

شەنیا: نەبابە ئەو لووت بە ئێمەیا داناهێنێ.

نیگار: ئیتر دڵە بڵێین چی گوڵەکەم؟.. هەرکەس بەدوای تەواوکەری خۆیا ئەگەڕێ.

زوبێر: ئەوە هەر زۆر زۆر ڕاستە، وەک من و نیگار.

(( پێکەنین ))

Cut

دیمەنی – ١٠١١ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن و خدر))

نارەوەن: فەقیرنیم ڕۆڵە.. لە هاتنە ژوورەوەوە تا چوونە دەرەوەی بە کامێرا تایبەتەکە وێنەیم گرت.

خدر: ئەک ئافەرین.

نارەوەن: کۆمپانیای چیت بۆ دائەنێ؟

خدر: ئەیەوێ بمکا بە ڕێشار،

# (( ئەڵقەی چل و نۆ))

تەواوکەری حواری خدر: بەڵام هیچی لەو بارەیەوە نەدرکاند.. باسی گواستنەوەی ئەکرد، ئەزانم چی بە دەستەوەیە.

نارەوەن: بۆ نایکەی؟ تا خۆیت لێ ئاشکرا ئەکا.

خدر: نا.. کێشەکە ئەوەیە من بە چاوچنۆک ئەزانێ و وا ئەزانێ چاوم لە سامانی ئێوەیە.. بیرم کردەوە کە ئەگەر نەیکەم، ئەو ڕاوبۆچوونەی لەسەرم ئەگۆڕێ ، جگە لەوەش وا تێ ئەگا نێوانی من و تۆ شتێکیتریشی تیایە بۆ دەست بەسەراگرتنی سامانەکەت، کە ئەمەم پێ باشە.. گەر بشیکەم، وابیر ئەکاتەوە کە دوای کابرایەکی نەناس کەوتووم و بێ ئەوەی بزانم چیم دەست ئەکەوێ، گەمژانە دوای ئەکەوم.. جا لەبەر ئەوەی ئەو بە گەمژەم نازانێ و خۆشم نامەوێ وا خۆمی بۆ دەرخەم.. تێکەڵم کرد .

نارەوەن: ئای ئەبێ چیت کردبێ؟ تۆ وریای.. چۆن تێکەڵ کردنێک؟

خدر: وتم ئەبێ نارەوەنیشم لەگەڵ بێ، ئەگینا نایکەم.

نارەوەن: ئەک ئافەرین بلیمەت.

خدر: کچێ زۆر خوێڕیانە قسەی کرد.

نارەوەن: ئادەی وتی چی؟ شەرم مەکە بیڵێ.

خدر: وتی ئەو قسەیەم تاقیکردەوە کە باستان ئەکەن پێکەوەن.. وتم بزانم چەند ڕاستە؟

نارەوەن: بتوتایە ڕاستە.. بۆ ئەوەی هەموو خەیاڵی هەر لای ئەوە بێ و درک بە هیچیتر نەکا، کە یەکتر ئەبینین.

خدر: بەڵێ..  من زیاتر ئەمەوێ بگەمە ئەوەی کە تەواوکەری نیزامە، یان تایبەتە بۆ من؟

نارەوەن: ئەی وتت چی؟

خدر: نە ئا.. نە نەء.

نارەوەن: چۆن؟

خدر: وتم گەر پەیوەندیمان هەبێ یان نا، ئەوە کاری تۆ نییەو پەیوەندیی بە خودی خۆمانەوە هەیە.. نەئەبووایە پرسیاری وا بکەیت و جارێکیتریش ئەو باسە بکەیتەوە خراپ عاجزت ئەکەم.. ئیتر یەکسەر پاشەکشەی کردو وتی ببورە لە زیادەڕۆییم.

نارەوەن: ئەی وتی باشە؟

خدر: نا وتی منیش لەسەروو خۆمەوە خەڵکیتر هەیە.. ناتوانم بڕیار بدەم.. تەلەفونت بۆ ئەکەمەوە.

نارەوەن: تەواو.

خدر: چی تەواو؟

نارەوەن: تەواو کۆمپانیاکەمان بۆ دائەنێت و تا زووە تریفە فێری ئیشەکانی ئێرە بکەم.

خدر: بەڵام با لە ئێستاوە نەیەت، گومان ئەکەن.

Cut

دیمەنی – ١٠١٢ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی))

شەنیا: کورە هاتنەوەی چی؟ توشی داوی عەشق بووە، هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە هههههه.

ڕەمزی: ئەوە زۆر باشە، ئەم ماوەیە ڕێمان بۆ تەخت ئەبێ.

شەنیا: ئێستا چی ئەکەین دوای ئیشەکەی مریەم کردی؟

ڕەمزی: ئیشیتر زۆرە.. جارێ ئەبێ ناوخۆمان ڕێک خەینەوەو هەندێ کەسی لێ دوورخەینەوە، کە لەملاولا شت ئەدرکێنن.

شەنیا: بە کوشتن؟

ڕەمزی: ئەی خۆ ناکرێ لێیانگەڕێین بە ئارەزووی خۆیان لە شوێنان بڵێن لەژێر هەڕەشەیا بە گروپەکەوە بەستراوینەتەوە.

شەنیا: وەک کێ؟

ڕەمزی: کە کوژرا پێت ئەڵێم هههه.

Cut

دیمەنی – ١٠١٣ – ڕ/د – لایەکی چایخانەکە:

(( ڕەوەزو ئەردەڵان وەستاون))

ئەردەڵان: من کاک ئاواشم بینی لەگەڵیا هەردووکیان پێکەوە ڕۆشتن.

ڕەوەز: بە سەیارە ڕۆشتنەوە؟

ئەردەڵان: نا، هەر کاک ئاوا بە سەیارە ڕۆشتەوە، مام لەتیف بەرەو لای ماڵی خۆیانەوە ڕۆشت (( ئاماژەی پشتی کۆمپانیای ئاوا ئەکا)) ئەها ماڵەکەیان لەو پشتەوەیە، زۆر دوور نییە.

ڕەوەز: باشە تێگەیشتم.. وەک پێموتی هەر کاتێ دەرگایان کردەوە یەکسەر تەلەفونم بۆ بکە باش.. لای کەس ئەم قسانە باس نەکەی کورە، ئەگینا ئەتکوژم ها!

ئەردەڵان: نە بابە چۆن قسەی تۆ ئەگێڕمەوە، هیچ خەمت نەبێ.. من تا ئێوارەش لێرە ئەبم، بەس بکرێتەوە تەلەفونت بۆ ئەکەم.

ڕەوەز: زۆر باشە دەستخۆش.. دواتر بەیانیش پاداشتی خۆت ئەدەمێ، لێرە نابێ با خەڵک نەمانبینێ.

ئەردەڵان: باشە، با بەیانی بێت.. من ئەمڕۆ هیچ ئیشێک ناکەم هەر بە دیار ئەو دەرگایەوە دائەنیشم.

ڕەوەز: وا نەکەی کەس هەستت پێ بکا.

ئەردەڵان: نە بابە خۆ مناڵ نییم.

Cut

دیمەنی – ١٠١٤ – ڕ- عەسر/ د – بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژو ڕاماڵ دێنە دەرەوە، تریفە بەڕێیان ئەکا))

ڕاماڵ: تۆ هیچت پێویست نییە دادە تریفە؟

تریفە: نا قوربانت، هەر خۆشیتان، سوپاس.

تیرۆژ: دەی ئێوارە نان مەخۆ، ئەزانم حەزت لە سەلەمونەکەیە، بە حازریی بۆت ئەهێنم.

تریفە: نا بەساقە دوێنێ خواردمان خۆ خان نییە؟

ڕاماڵ: ئەمڕۆش بیخۆ، ماسی زیانی نییە.

تریفە: نەبابە ئێوە ئیشی خۆتان هەیە، خۆتان بۆ من مەحتەل مەکە.

تیرۆژ: بڕۆ ڕاماڵ.. (( بۆ تریفە)) ئەوە وتم نان نەخۆیت، با خەسار نەبێ.

تریفە: دەی خوا ئاگادارتان بێت.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی تیرۆژو ڕاماڵ و چوونە ژوورەوەی تریفە بە خەندەی کەمەوە))

Cut

دیمەنی – ۱۰۱۵ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان لەگەڵ ڕەمزی دانیشتوون))

دیدەوان: من سروشتی ئیشەکەم پێویستە، تاقەتی تێوەگلانم نییە بە دوژمنایەتییەوە.

ڕەمزی: نا بۆ وا بە خێرایی بڕیار ئەدەی؟ تەنها سوود لە ناو و ناسنامەکەت وەرئەگرم و ئیشێکی بێ کێشەت بۆ دائەنێم لە بەڕێوەبردنی کۆمپانیایەکدا، خۆت لە نزیکەوە ئاگادار ئەبیت و هیچ شتێکت لێ ون نابێ.

دیدەوان: ئەوە زۆر پێویستە یەکێکمان ئاگادار بین، بەڵام چ جۆرە ئیشێک؟

ڕەمزی: کاک دیدەوان گیان لەم ڕۆژانەدا دوای ئەوەی کۆمپانیاکە کرایەوە، تۆ ئەچیتە ژمێریاریی کۆمپانیاکە، هەر جوڵەیەکی ڕێگە پێدراو و ڕێگە پێنەدراوت بینی، دەماودەم بڕیاری لەسەر ئەدەین.

دیدەوان: زۆر باشە، بەدڵمە.. وتت نارەوەنیش دێت؟

ڕەمزی: ئەگەر زۆرە، وا ڕێککەوتووین.

دیدەوان: تۆ پێم بڵێ جوانە؟

ڕەمزی: نەبابە تەمەنی زۆر زۆرە بەڵام تۆزێ دەست بە خۆیا ئەهێنێ.. هیچ نییە.

دیدەوان: جا خاڵە خۆ ئێمەش مناڵ نیین، ئێمەش تەمەنمان زۆر زۆرە هههههە.

ڕەمزی: وایە هەر دەوروبەری تەمەنی خۆتەو ژنی دارەوانیشە ڕەنگە بینیبێتت!

دیدەوان(( پێکەنین)): نەمبینیوە.. دەی بەڵکو دوای دارەوان لەگەڵ منیشا دووبارەیکاتەوە، خۆت ئەزانی ڕەبەن و سەڵت و قوڵتم.

ڕەمزی: ڕێک منیش بۆ ئەوە ئەڵێم تۆ باشی بۆ ئەو جێگەیە، ئەزانم سەرت لە ژنان ئەخورێ و هەرچییەکیشی هەیە ئەو ژنە، لە ناوچەوانی ئێمەوە دەستی کەوتووە.. ئەو هەتیوەی لەگەڵیایەتی تا ئێستا نامۆیە بە ئێمە.. ئەگەر نەیەتە ڕیزەوە ئەبێ فتیکەین.. ئەیخۆ ناکرێ کابرایەکی بەڕانیی لەولاوە بێت و بیخوا.. ڕاستت پێ بڵێم لە

سەرەتاوە ئەوە مەبەستم بوو لە هێنانی ئەو خدرە.. ئەبێ هەر بێتە ژێر سایەی خۆمانەوە، نەک ئەملاولا بکا.

دیدەوان: ژنەکە ئەهێننە ڕیزەوە؟

ڕەمزی: بە دڵی خۆی.. بەڵام گەر تۆ بتوانی ئەوە بکەی ئەو ژنە بهێنیت، ئەوسا ئێمە بە ئیسراحەت پاڵی لێ ئەدەینەوەو بە هۆی تۆوە ئیش باشتر ئەڕوا.

دیدەوان: باش بوو ئەوەت پێوتم.. هەر لەڕێوە ئیشی لەسەر بکەم باشە.

ڕەمزی: تۆ دەمێکە دابڕاوی، ناوەکەت زۆر گرنگە بۆ ئەو بابەتە، چونکە زوو بە کاک دارەوان هەڵخەڵەتابوو.. گەر ئەم هەتیوەی لەگەڵیایەتی تەفرەی نەدابێ.. ئیتر تۆ ئەتوانی دەست بەکار بیت.

دیدەوان: ناوەکە!!!!! ئای ناوەکە؟! ئەو ناوە من و دارەوان پێکەوە دامانناوە.. دیدەوان و دارەوان.. ئەوسا لە برا نزیکتر بووین لەیەکەوە، تەماع فریوی نەدابوو.. بەهەرحاڵ ئیشێکی خراپ دیار نییەو خدریش دەستەمۆ ئەکەی، زۆر باشە.

ڕەمزی: ڕاستیەکەی میری گەورەش ویستی کەسێکیتری خۆمان ئەو ژنە بهێنێ، هانیدابوو بۆ بازرگانیی هۆشبەرو ژنەش زۆری پێخۆش بوو، ئیتر بەهۆی هەڵەیەکەوە، ئەو گیرا.. بۆیە لە ئێستایا هەموو هێڵەکانیتر لە تۆ دوور ئەخەمەوە، تا هیچ بەڵایەک ڕووت تێ نەکاو ئیشەکە مەیسەر بکەین.

Cut

دیمەنی – ١٠١٦ – ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( خدرو نارەوەن))

خدر: مادام هەموو شتێک تەواو بووە، ئاگاداری کاک ڕاهۆز بکەرەوە.. بەیانی و دوو بەیانی ئەچینە سەر کاری تازە.. نازانم مەسەلە چییە؟ زۆر زۆری پەلەیە.

نارەوەن: جارێ سەری لێدەرناکەین، هەرکاتێ خۆت وتت، شتەکان لە سەرەتاوە ڕوون نیین.. خۆی دەرئەکەوێ.. ئەوەی تۆ زۆر باش بوو ئەو ماوەیە خۆت لێ شاردنەوە، ئەوەت نەکردایە، ئەکەوتینە هەڵەوە.

خدر: بەوەی باشە من زوو تێ ئەگەم خەڵک تیر بۆ کوێ ئەهاوێ.. ئەوەش ئەنجامی ئەزمونە، لە هەر چالاکییەک شتێ فێر ئەبین.. بەڵام من لە یەک خاڵ ئەترسم.

نارەوەن: تا ڕوون ئەبێتەوە، هەموو جووڵەیەک شایانی ئەوەیە لەسەری بوەستین.. بەڵێ مەترسیداریشە.. تۆ مەبەستت کام خاڵەیە؟

خدر: زۆر گوێیان بە هاتنی تۆ نەدا.

نارەوەن: جا ئەوە چی ئەگەیەنێت؟

خدر: بە ڕای من ئیشەکە لەسەر تۆ ئەکرێ نەک من.. بەکارهێنانی من تەنها وەک مقاشە، تۆم پێ ڕابکێشنە ناو یارییەکەوە.

نارەوەن: ئەبێ منیان بۆچی بێت؟

خدر: بیرت نەچێ، ئەمانە هەموو پاشماوەکانی دارەوانن.

نارەوەن: ئەبێ شوێنی ئەم ڕەمزییە بزانین.

خدر: شوێنی ڕاستەقینەی خۆی ناڵێ دڵنیابە، هەروەک ئێمەش ناکرێ بەو شێوازی ئیشەی خۆمانەوە بچینە پێشەوە، گرنگترین شتێک، خۆمان لە هەموو جوڵەیەکی گوماناوی بپارێزین.

Cut

دیمەنی – ١٠١٧ – ش/ د – باخی ماڵی گێلاس:

(( ئاواو نیناو گێلاس و ئاکۆ لە باخەکە دانیشتوون))

ئاوا: ئێستا سەر دەریاو هاوینەهەوارەکانی ئەوێ خراپ نیین.. خۆشمان شوقەمان هەیەو ڕێک هەر لەڕێوە ئەبین بە ماڵ.. خۆشی حەزی لە میسرە.. ئەگینا هەر شوێنێکی بوێ ئەچین بۆ ئەوێ.

ئاکۆ: دووبەیانی ئەڕۆن؟

ئاوا: بەڵێ.

نینا: دوو سبەی گەشتی فڕۆکەوانیی هەیەو بلیتەکەش بۆ دووسبەیە.

(( پیرۆزبایی سەفەرسەلامەتیی ئاکۆو گێلاس))

Cut

دیمەنی – ١٠١٨ - ش/ن – ماڵی نیگار:

(( نیگارو دەوران دانیشتوون و نازەی کارەکەر، تەمەن ٣٠ بۆ ٤٠ ساڵ قاوەیان بۆ ئەهێنێت و دەستخۆشیی))

نازە: من ئەتوانم ئیتر بڕۆم؟

نیگار: بڕۆ نازە گیان، ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووی، لەشت ساغ بێ یاخوا.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی نازە.. دەوران و نیگار تەماشای تیڤی و مۆبایل))

نیگار: ئەو کوڕە هیچ نەهاتۆتە پێشەوە؟

دەوران: نەوەڵا هاتنە پێشەوەی چی؟ نە ئەو بەو چاوە تەماشام ئەکاو نەمنیش.. کوڕێکی باشە.. حەز ئەکەم هاوڕێم بێ و هیچیتر.

نیگار: ئاخر جارێکیان تۆ باسی خۆشویستن و شتی وات کرد.. وتم بەڵکو بەختت بکرێتەوەو تۆش بچی بەڕێی خۆتەوە.

دەوران: ئەوە دایە بە گێلم ئەزانی؟ بۆ من نازانم شینەکەت شینی خواردنی تەعزێکەیە نەک مردووەکە؟ ها ها ها.. تۆ زۆر بەداماوم ئەزانی، خەریکە بەزەییم بە خۆما بێتەوە.

نیگار: جا بۆ نا کچم؟ ئەگەر واش بێ ناهەقم مەگرە.. ئەی کە تۆ بچی بە ڕێی خۆتەوە، ئەوسا بە تەنیا چی بکەم؟ ها؟ ئەوا نازە ڕۆشتەوە، تۆش بڕۆی خۆ لەم سەرا گەورەیەیا هەر ئەتۆقم.

دەوران: دە ئێوە هاوسەرگیریی خۆتان بکەن و منیش لای ئێوە ئەبم.. هیچ پەلەی شوو کردنیشم نییە.

نیگار: ئەوە بەڕاستتە؟

دەوران: هەر زۆریش.

نیگار: یەعنی پێکیشەوە بژین بێ کێشە ئەبین؟

دەوران: دڵنیابە، بە ژیانتان بە هۆی منەوە کێشەتان بۆ دروست نابێ.

نیگار: یەعنی سبەی پێی بڵێم؟

دەوران: ئەگەر پەلەشتە بە تەلەفون پێی بڵێ. هههههه.

نیگار(( سوعبەت)): هەی بێتەربێت هههههه.

Cut

دیمەنی – ١٠١٩ – ش/ن – ژوورەکەی ئەردەڵان:

(( ئەردەڵان هەندێ پارە ئەژمێرێ و دواتر قوتووە گەورەی شەکرەکە لەسەر پەڕۆیەک ڕۆ ئەکات، لە ژێرەوە هەندێ پارەیتر هەیە، سەد دۆلاریشی تیایە، لە پەنگوینێکدایە.. ئەیکاتەوەو ئەم پارەیەشی ئەخاتە سەرو شتێکی زۆر کەم ئەخاتە گیرفانییەوە.. دواتر پەنگوینی پارەکە قەد ئەکات و ئەیخاتەوە ژێرەوەی قوتووی شەکرەکەو شەکرەکە ئەخاتەوە سەری))

ئەردەڵان: خوا نەیبڕێ، ئەشهەدوو کاکە ڕەوەز نیعمەتەو بەسەرما باریوە (( بە کوڵ دووعا ئەکا)) ئەک خوا نەیبڕی خوا!!

(( ئەچێتە جێگەوەو ڕا ئەکشێ بۆ خەو))

Cut

دیمەنی - ١٠٢٠ - ش/ن - ڕاڕەوی کۆمپانیای ئاوا:

(( مام لەتیف بە دیار وەستایەکەوە وەستاوە، کامێرای چاودێریی دائەنێت.. حوارەکان لەسەر جوان دانان و دیار نەبوونی کامێراو وایەرە بە پێی پێویست، یەک دوو کامێرا دائەنرێ، یان هەر مۆنیتەری چوار کامێراکە نصب ئەکرێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٢١ – ڕ/ د / بەردەرگای ماڵی نارەوەن:

(( خدر لە سەیارەکەیدایە، گێلاس و تیرۆژ لە ناو سەیارەی گێلاسدا.. سڵاوێک ئەکەن و هەواڵپرسین و سەیارەی گێلاس ئەڕوات.. خدر دوو هۆڕن لەسەر یەک لێ ئەدا.. زۆری پێ ناچێ تریفەو نارەوەن دێنە دەرەوە))

نارەوەن(( سوعبەت)): ئەرێ ئەو هەموو هۆڕن لێدانەت لە چییە کورە؟ گەڕەک ئەهێنیتە سەرمان؟ هههە.

خدر: ئۆو بیرم چووەوە تریفەخانیش دێت.. وایە ئەبێ تا خۆی لەتەل ئەدا پێتان بچێ.

تریفە: دەی سا بەخوا من دەمێککە حازرم، دایکم چاکەی تەواو نەکردبوو.

خدر: ئای لە چاکانی نارەوەن، ئەوە لەوێش وایە با بزانی هههە.

نارەوەن: هەر چاکە چاکە.

(( بەدەم قسەکانەوە سەرئەکەون، سەیارەکەی تریفەش لەبەردەرگاوە دیارە))

Cut

دیمەنی – ١٠٢٢ – ڕ/ن –ماڵی ڕەمزی:

(( لەسەر مێزێک یان تەپڵەکێک، هەندێ پاشماوەی مەشروب و مەزە دانراوە.. ڕەمزی و دیدەوان هەر یەکەیان و لەسەر قەنەفەیەک خەوتوون.. ڕەمزی خەبەری ئەبێتەوە.. ئەچێ دەست و دەموچاو ئەشوات و دێتەوە.. ئەکرێ ئەم دیمەنە دابەش بکرێ بەسەر سێ دیمەندا.. چوونە دەرەوەی ڕەمزی بۆ توالێت و دەم و چاو شتن و گەڕانەوەی بۆ لای دیدەوان.. ژمارەی دیمەنەکان بە ئەلف و بێ جیابکرێتەوە.. کە ئەگەڕێتەوە دیەوان هەڵئەسێنێ))

دیدەوان: درەنگە؟

ڕەمزی: ئەی تۆش ئەچی بەلای کابراوە.

دیدەوان: باوەڕ ئەکەی خەوەکەم پێ خۆشترە؟

ڕەمزی: هی خواردنەوەکەی شەوێیە، ئێستا ئەچی سەرنجی وردت ئەوێ وریابە.

دیدەوان(( لە جێگە ڕائەپەڕێ)): ڕاست ئەکەی، ئەمڕۆ تایبەتەو ڕۆژی ئیشە.

(( دیدەوان ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٠٢٣ – ڕ/ن – چایخانەکە:

(( خدرو نارەوەن و تریفە لە سەیارەکەی خدر دائەبەزن و بەرەو ئۆفیس ئەچن.. ئەردەڵان بە تەنیشتیانا بەرەو چاخانەکە دێت و بە گەرمیی سڵاویان لێ ئەکاو ئەوانیش ئاسایی.. دێتە نزیکی هاوڕێوە))

ئەردەڵان: خۆ بینیت؟ بە چاوی خۆت بینیت؟! ئێستاش ئەڵێی وانییە؟

هاوڕێ: چییە هەتیو تۆ کاک حەمەخدر ئەبینی ئیتر ماخۆلان ئەتگرێت، ئەوە کچی نارەوەن خان بوو لەگەڵیانا.

ئەردەڵان: ئاخر منیش کچەکەی ئەڵێم.

هاوڕێ: چییە دەروون ڕەش! بۆ ناڵێی خۆی و کچەی هەردووکیان شووی پێ ئەکەن؟

ئەردەڵان: نا من وا ناڵێم، بەس تۆ بە کەڵکی قسەکردن نایەیت، هەر ناوی خدر بێنم تۆ وەک فیشەکە شێتە ئەچی بە ئاسمانا.

هاوڕێ: ئاخر قسەو بوختانی تۆ لە ئەقڵا نییە مردووت مرێ.

ئەردەڵان: ئادەی بزانم بۆ من دەروون ڕەشم؟ بتکوشتمایەو ئەو قسەیەت نەکردایە.. تۆ ئەزانی وتت چێ؟ منت کوشت!

هاوڕێ: جا بۆ هێشتا نەمردووی دەروونڕەشی پیس.

ئەردەڵان ئەوە دیسان وتیەوە؟ ئا بزانم دەروونڕەشیی من لە کوێیایە؟

هاوڕێ: ئەی ئەبینی ئەویش لەگەڵتا حەماڵ بووەو ئێستا ئەو لە کوێیەو چۆن ئەژی؟.. تۆی فاشیلیش هەروەکو خۆت حەماڵەکەی جارانی، ئیتر دەروونت ڕەش بووە بەرامبەری و پێت ناخۆشە ئەیبینی سەرکەوتووە.. ئەگینا ئەو هەر وەکو جارانە لەگەڵتا.

ئەردەڵان: دە بڵێ مەسەلە پارەیە، باشە هاوڕێ، ئەمەت بۆ لە سنگم ئەهاوم ناهاوڕێ، ڕۆژێک ئەتبینمەوەو ئەمڕۆت بیر ئەخەمەوە.. منیش ئەوەندەم نەماوە بیگەمێ.. مادام پارە هەموو شتێک بێ، شەرتە منیش هەموو شتێکی بۆ بکەم.

هاوڕێ: کورە وەرە دانیشە چاکەت بخۆرەوە، کەرەکەر مەکە.. ئەوە بە هەموو کەسێ پەیا ناکرێ.

ئەرەدەڵان: چای تۆ ناخۆمەوە، عاجزت کردم.. بەڵام بزانە ئەوە بە منیش ئەکرێ، بەڵام عیزەتی نەفسم ڕێی لێگرتووم.. لەمەودوا ئەیبینی.

هاوڕێ: کورە کەرە وەرە بەسە فشە فش، خۆ ئەمە قسەی یەکەمجارت نییە؟!

(( ئەردەڵان دەست هەڵئەتەکێنێ و ئەڕوا ))

______ تابع ____________ Cut ______________

دیمەنی ١٠٢٤ – متبوع – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تێبینی: مەبەست لە تابع و متبوع، بۆ ڕاکواری جلوبەرگی دانیشتووانی دیمەنەکەیە))

(( خدرو نارەوەن و تریفە دانیشتوون، نارەوەن مۆبایلەکەی بە گوێیەوەیەتی دایئەنێ))

نارەوەن: ئەڵێ هەر ئەمە بەڕێ ئەکەم و ئێستا دێم.

خدر(( بۆ تریفە)): هەر هیچ نییە تریفە گیان، هەرچیت لای هەندرێنەوە بۆ هات، تۆ لەم تۆمارە ئەینوسیتەوەو ئەمە هەموو ئیشەکەیە.

تریفە: ئەزانم ئاسانە، بەڵام یەکەمجارمە با هەڵە نەکەم.

نارەوەن: ڕاست ئەکا، با ئەوەی ئێستا هەندرێن ئەیهێنێ، پێی بڵێین چۆن تۆماری بکات و ئیتر ئێمە ئەڕۆین. (( لە کاتی قسەی نارەوەندا خدر زەنگی بۆ دێت))

خدر(( بە مۆبایل)): ئەلوو بەڵێ؟! ............. سەرچاوم سوپاس......... نا لە بیرمانە چۆن بیرمان ئەچێ؟.. وا هاتین......... باشە!

(( هەندرێن دێتە ژوورەوەو پارچە کاغەزێکی پێیەو سڵاو.. نارەوەن لێی وەرئەگرێت و تۆمارەکە ئەکاتەوەو تریفە فێر ئەکا چۆن بینوسێ))

تریفە: زۆر ئاسانە، هیچ نییە.

نارەوەن (( هەڵئەسێ و خدر بەدوایا)): ئیتر ئەوە کاکە هەندرێنیشی لێیە، هەرچیت پێویست بوو هاوکارییت ئەکا.

هەندرێن: سەرچاو من لە خزمەتدام.

تریفە: نا پێویست ناکا، زۆر ئاسانە، هەر بۆم بنێرێ و هیچیتر.

(( خواحافیزیی و چوونە دەرەوەی نارەوەن و خدر))

Cut

دیمەنی – ١٠٢٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا بە تەنیا خەریکی قیاسات و نوسین و ژماردنە بە حاسبە، ڕەمزی دێتە ژوورەوە ))

ڕەمزی: ئەی ئەوە پلکت لە کوێیە؟

شەنیا: ئەی خۆ ئەو وەک ئێمەومانان نییە خاڵە، چووە بۆلای ئازیزی دڵ.

ڕەمزی: باشتر.. تۆش وا بکە خوشکەکەی ئامۆ کار بکاتە سەر ئامۆ بۆ پێکگەیاندنتان.

شەنیا: ئەتوانم یەک پرسیار بکەم؟

ڕەمزی: ئەگەر ئاسایی بێت بۆ نا؟

شەنیا: ئەوکاتەش ئێوە ڕامالْتان وا لێکردبوو، بە هەر نرخێک بێ من لە ئامۆ جیا بکاتەوەو بۆ ئەو بم؟

ڕەمزی(( بە پۆزەوە )): ئا، بەڵام بۆ ئەو نا، ئەوەیان تاکتیکی خۆم بوو، بەڵام ئەوکاتە ئێمە تۆمان مەبەست بوو.. میرو باوکیشت بە نیازبوون لە ڕێگەی تۆوە پارە لە ئامۆ بکێشنەوەو تۆ بدەن بە ئامۆ.. لای ئێمەش ماڵی کاک دارەوان هێڵی سوورە، بەڵام پاشاو میر لەمە نەگەیشتبوون، گەر بەردەوام بوونایە، بە تۆشەوە هەرسێکتان خۆمان ئەمانکوشتن.. با بزانیت ئەو پارەیەشی کە ڕامالْ بۆی هێنایت و داتە ئامۆ بۆ باوکت، هەر خۆمان بە گوڵزارا ناردمان بۆ ڕامالْ.. تا ئامۆ ببێتە هۆکارێک بۆ دوور کەوتنەوەت لە ئامۆ. چۆن درکت بەوە کرد؟

شەنیا: لە وردەکاریی ئیشەکانی ئێوەوە شتێک تێگەیشتبووم، بەوە نییە قسە ناکەم.. یەعنی ڕامالْیش ئەو پارەیەی نییە؟!

ڕەمزی: ڕامالْ لە سەرسوالْکەرێک زیاتر نییە، کارگەکەشی هی خۆمانەو بۆ ئێمە کار ئەکا.. ئەسڵەن ڕامالْ هەر نازانێ کێ ئەیبا بەڕێوە.. هەست بە جوڵەیەکی ئەکەین، جێی نیگەرانییە.

شـەنیا: وەکو چـی؟

ڕەمزی: جارێ لێبگەڕێ.. من مەبەستمە پێت بڵێم، دایکی ئامۆ لە ئۆفیسەکە نەماوەو ئێستا تریفەی خوشکی لێیە.. ڕەنگە ئاسانتر زەفەری پێبەری.. گەر تۆ ژنی ئامۆ بیت، هیچ کێشەیەک نامێنێ.

شـەنیا: ئەی دایکی ئامۆ چی لێهات؟

ڕەمزی: لە شوێنێکی ئەمینترە.

شـەنیا: کەی بچم بۆلای تریفە؟

ڕەمزی: لە نان خواردنی نیوەڕۆیا ڕێستێک وەرگرەو بجۆ.

(( ڕەمزی ئەچێتە دەرەوەو شەنیا دەست ئەکاتەوە بە ئیش))

Cut

دیمەنی – ١٠٢٦ – ڕ/ د – شەقامێکی ناو نەخۆشخانەی زوبێر:

(( نیگارو زوبێر پیاسە کردن یان وەستاون))

زوبێر: نا دەوران تەواو تێگەیشتووە، ئەو نایەوێ وەک ئێمە بڵێ با خەڵک ناومان نەهێنێ و قسە دروست نەکرێ، ئەو بە شێوازی خۆی دەری ئەبڕێ.. هەی ئافەرین دەوران.. دەی کەواتە با ئێمەش خۆکەوین، قسەکەی ئاقڵانەیە.

نیگار: زۆر بە ئاگایە، بەڵام وردە وردە قسەم لێدەرهێنا، هەست ناکەم ئەو و ئامۆ هیچ هەستێکی خۆشەویستی و سۆزدارییان بۆ یەکتر هەبێت.

زوبێر: ئەوەندەی منیش بزانم لای ئامۆشەوە هەروایە.. بەڵام بیرت نەچێ بە یەکتر زۆر مورتاحن.. ڕەنگە لە داهاتوودا خۆیان بڕیار بدەن، یان هەر لە بنەڕەتیشەوە هیچ، هەروابووبێ.. ئێمە هەقی ئەوانمان چییە شاژنی جوانم؟ با باسی خۆمان بکەین.. من و تۆ ڕەنگە هەر نەشزانین گەنجی ئێستا چۆن ڕێڕەوی ژیانیان ئەدۆزنەوە.. ئەوەی لەسەرمانە تەنها ڕێنوێنیی کردنیانە.

نیگار: باشە، خۆ دەوران ئاوەدانییشە لە ماڵەکەیا بێ، هههههه شێت و شبری وەک خۆی نەبۆتەوە.

زوبێر: بە ڕاستی خۆشم ئەوێ وەک چیمەن و سەلوا.

نیگار: ئینجا کەی دێیتە پێشەوەو بچینە ماڵەکەوە؟

زوبێر: کامەیان؟

نیگار: من حەزم لەوەی خۆمە پێی ڕاهاتووم.. تۆش بە دڵی خۆت.

زوبێر: ئەوی من باشترە گوڵنیگار گیان، هیچ نەبێ چاوێکیشم لە مناڵان ئەبێت و نزیکیشن، ئەوانیش چاویان لێمان ئەبێ.. ئەی وا نییە؟

نیگار: کەمێک بچووک نییە؟

زوبێر: نا، ئێمە لەوە زیاترمان بۆچییە؟ ژووری دەوران گیان هەیەو خۆمان و هۆڵ و ژوورێکی نوستنی زیادەو ئیتر چیمان پێویستە؟

نیگار(( سارد )): دەی باش.. با پرسێکی دەوران گیانیش بکەم.

زوبێر: با نەخۆشخانەکەش کەمێک ڕێڕەوی خۆی وەرگرێ، تا ئەوکاتەش هەموو شتێک ساغ ئەکەینەوە، خەمت نەبێ ڕوحەکەم.

(( بەردەوامیی لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ١٠٢٧ – ڕ/ د – ژوورەکەی دڵنیاو ئارەزوو:

(( دڵنیا خۆی گۆڕیوە، ئارەزوو قژ دائەهێنێ))

ئارەزوو: باشە هەر ئەبێ کاکم چووە دەرەوە تۆش بەدوایا تێی قوچێنی؟

دڵنیا: دە ڕۆڵە ئەگەر ئیشم نەبێ، بۆ ئەچمە دەرەوە، خۆ زۆرم حەز بە خۆگۆڕین و مکیاژ نییە، خۆت نازانی؟

ئارەوەزوو: با با چاک ئەزانم، بە تۆ بێ ڕۆژیی سەد جار خۆت بگۆڕیت و خۆت داکەنیتەوە.

دڵنیا: وەی دەرد ئەوە بۆ جارێک بە قسەیەکم نالێی وایە.

ئارەزوو: ئاخر قسەکانت هەموو وایە، بۆیە.

دڵنیا: ئەڕۆم ئەڕۆم، بەرچاوت چۆڵ ئەکەم.. ئەوسا هەر خۆت بە تەنیا لە ژوورەکەیا ئەمێنیتەوە، بەڵکو ئیشەڵڵا گورگ بتخوا.

ئارەزوو: تۆ بڕۆ بەساقە شووی خۆت بکە، قیروسیا با گورگەکە من بخوا، خۆ ئیتر لەدەست گۆرانییە ناخۆشەکانی تۆ ڕزگارم ئەبێ.

دڵنیا: ئاخر نەیەیت بگریت بەسەرما بڵێی بیرت ئەکەم.

ئارەزوو: نەبەخوا قەت نایەم، تۆ بڕۆ!!!!

دڵنیا(( هەڵئەسێ)): ئاوا!! یەعنی منت خۆش ناوێ.. دە ئەوە ڕۆشتم (( ئەچێتە دەرەوە))

ئارەزوو: باااااای.

Cut

دیمەنی – ١٠٢٨ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای تازە:

(( خدرو نارەوەن لە سەیارەی خدر دائەبەزن و چاو ئەگێرن، حوارەکان پەیوەندیی بە تەلارەکەوە هەیە، تا ئەیدۆزنەوە.. ئەچنە ژوورەوە))

تابع ____________ Cut ____________

دیمەنی – ۱۰۲۹ – متبوع - ڕ/ ن – کۆمپانیای تازە:

(( مێزو دوو کورسی بەردەم و یەکی دەوار لە پشتەوەی تیایەو قەنەفەو سەلاجەی بچووک و تەپڵەک و قاصەیەک.. دیدەوان و نارەوەن و خدر، لەسەر کورسییەکانی بەردەم و قەنەفە دانیشتوون.. دیدەوان کەسایەتیی نمایش ئەکا.. خدرو نارەوەن دێنە ژوورەوەو پاش سڵاوکردن و وەڵام))

دیدەوان: وا ئەزانم ئەم ژوورە بۆ هەردووکتان بەسی بێ.. ئەگەر پێشتان خۆشە هەردووکتان سەربەستتر بن، ئەوا ژوورێکیتریشتان بۆ ڕێک ئەخەم.

خدر: نا.. بەسە.

دیدەوان: هەرچییەکیترتان پێویست ئەبێ لە خزمەتدام، تا ئیش ئەجوڵێ، کاک ڕەمزی پارەی بۆ جێهیشتووین.

نارەوەن: ئەی خۆی نایەت بۆ ئێرە؟

دیدەوان: نا خانم، خۆی قەت نایەت، توخوا ببورە وتت ناوم ننارەوانە؟

نارەوەن: نا.. نارەوەن!

خدر: کەی بە ڕەسمی ئیش دەست پێئەکا؟

دیدەوان: هەر کە هاتن، ئیش دەستی پێکرد.. ماوەتەوە چایچییەک بێت و بەردەستێک و دوو سێ کارمەندو حەماڵ. بە کردنەوەی ئێرە، ئیشەکان دێنە پێشەوە.. من ئەمڕۆ مشوری ئەوانەم بۆ خواردوون و ئەوانیش دوای چەند سەعاتێک لە خزمەتتانا ئەبن.

خدر: تۆش ژمێریارەکەمانی؟

دیدەوان: بەڵێ لە خزمەتتانام، ئەگەر ناوەکەشمت بیر چوو، هەر بە ناوی نارەوان خانا بیرت بکەوێتەوە.

نارەوەن: نارەوەن نەک نارەوان، با لەسەر ئەمە شەڕمان نەبێت لە ئێستاوە.

دیدەوان: من و شەڕ کوجا مەرحەبا؟.. جا بەتایبەت لەگەڵ خانمێکی ناسکی وەک تۆ.

نارەوەن: ئیتر ئەوە پێم وتی، من لە شەڕا ناسکییم نامێنێ، شەڕ شەڕە وریابە.

دیدەوان: تۆ ئەمر ئەکەی نارەوەن خان.

خدر: ئێمە ئەمڕۆ تەنها بۆ بینینی شوێنکاری تازەمان هاتین.. سبەی لە کاتی خۆیا دەستبەکار ئەبین.. هەرچییەکیش بوو، ئەوە ژمارەی مۆبایلم بینوسە.

دیدەوان: نارەوەن خان با ئەوی تۆشم لابێ.

نارەوەن: ئاساییە، ئێمەش ئەبێ ئەوی تۆمان لابێ.. لە ئێشا هەموو خوشک و براین.

(( دیدەوان ژمارەکان ئەنوسێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٣٠ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێز و سەردار و ئاری و مفەوەز، دانیشتوون))

سەردار: نا قوربان سوپاس، هێشتا تامی چای پێشوو لە دەممایە.

بەهێز: قسەکەت تەواوکە، هەرکات حەزت لێکرد، داوایکە.

سەردار: دارەوان جیهانێکی نیشانی ئێمەدا، پڕ لە خۆشیی و سەروەت و سامان و کەیف و سەفا.. بە ڕاددەیەک بەخیلیم بەوە ئەبرد ئەو پاشا بوو.. بەڵێ ئەو کابرایە بە حەق خوێنڕێژێکی نائاسایی بوو، جارێکیتریش ئەم قسەیەم کردۆتەوە، ئەیوت، هەموو شتێک بکە، بکوژە بفڕێنە خەڵک بخەرە سواڵ.. هەموو شتێ بکە، بۆ خۆت بژی.. ئەمانە بۆ بەدەستهێنانی ژیانێکی خۆش.

بەهێز: کەس نەبوو پێی بڵێ تۆ شەرعیەتت لە کێ وەرگرتووە ئەم کارانە بکەی؟ کەس نەبوو بیری بخاتەوە یاسا هەیەو کۆمەڵ شەرعیەتی بەو یاسایە داوەو بەو یاسایەش ڕێ لە هەموو کردەوەکانی تۆ ئەگیرێت و سزای خراپی لەسەر ئەدرێی؟

سەردار: قوربان لەو هەموو سەڵتەنەتە بەرفراوانەیا کە یەکێکی وەک من هەیبوو، بە بێ ئەوەی دەستبەرم بۆ ڕەش و سپی، لە کوێ لە خەیاڵی یاساو خەڵکدا بووم؟.. گرنگ ئەوە بوو هەرچییەکم بویستایە، دارەوان بە فرمانێک بۆی جێبەجێ ئەکردم.

بەهێز: کەواتە شۆڕش و کوڕەکەشیت لەبەرئەوە کوشت تا کچەکەیت بۆ ڕام بێت و بیهێنی؟ ئەویش ئەوە بوو کە دڵت ئەیخواست.

سەردار: بەڵێ کوشتنی شۆڕش بۆ ئەوە بوو، کوڕەکەی مناڵ بوو، نەیئەتوانی لەو ئاڵۆزیەدا نارەزایی نیشان بدا.

بەهێز: ئەی بۆ کوشتت؟ ئەو مناڵە پاشەڕۆژێکی جوانی هەبوو.. هونەرمەندێکی باشی لێدەرئەچوو.

سەردار: لەبەر دەست ڕەنگینییەکەی کوشتم.

بەهێز: چۆن؟

سەردار: ئەو کوڕە چەند ڕەسمێکی منی کردبوو، بە ڕاستی زۆر جوان بوون.. ڕۆژێک باوکی وتی، کوڕەکەم وێنەی دزەکەی کێشاوە، ئەوی پارەکەی خوشکی شۆڕشی فڕاند.. بەڕاستی من چاوم پەڕییە پشتی سەرم.. نەجات بۆ من داری دەست و گۆچانی سیحراویم بوو، بۆ هەموو کارێکی قورس ئەوم ئەنارد.. ئیتر تێگەیشتم نەجاتم فت.. ئەگیرێ.. لەبەرئەوە خۆمحەسەنم بۆ ڕاسپاردو نەجاتی کوشت تا بەردەستی ئێوە نەکەوێ و هەموو شتێکی منیش ئاشکرا نەکا.

بەهێز: نەجات خزمت بوو؟

سەردار: نا، بەڵام ئەگەر کوڕم ببوایە لە نەجاتم خۆشتر نەئەویست.. بە کوشتنی نەجات من جەرگم سوتا.. کوشتنی کوڕەکەی شۆڕش تۆڵەی نەجات بوو، تا نەمکوشت ئۆخەیم نەکرد.

بەهێز: چۆن ئەو چیرۆکەت بۆ دروستکرد؟

سەردار: پێشتریش وتم بە پاشام سپارد.

بەهێز: نەتئەزانی کوشتنی شۆڕشیش تاوانێکی گەورەیە؟ هەموو کەسێ خۆی بەرپرسە لە خێزانی خۆی، بۆ ئەوەت کرد؟

سەردار: دەسەڵاتم هەبوو، هەموو شتێ بە دڵی من ئەبووایە بگوزەرێ.

بەهێز: بە ڕاددەیەک زیان بە هاووڵاتیان بگەیەنیت؟

سەردار: لای ئێمە هاووڵاتیی مانایەکیتری هەبوو.. کۆمەڵە خەڵکێک بوون بۆ خزمەتکردنی ئێمە.. هیچ مافێکیان نەبوو لە ئەرک زیاتر.. بۆمان هەبوو بیانکوژین، بیانبڕین، سەریان پانکەینەوە.. ئەوە بە میزاجی ئێمە بوو نەک خواست و ترسی ئەوان.

بەهێز: جۆرێک بوون لە بابەتی داعش و ئەو جۆرە دڕندانەیتر.

سەردار(( پێکەنین)): پێم سەیرە ئاوا بیر ئەکەیتەوە، خۆ تۆش دەسەڵاتت هەیە، یەک دنیا ئەستێرە بە شانتەوەیە.

بەهێز: دەسەڵات ئەبێ بۆ خزمەتکردنی خەڵک و ڕێکخستنی ئەرک و مافەکان و خۆش ژیانی خەڵک بەکار بهێنرێ، نەک فەرامۆشکردن و چەوساندنەوەیان.

سەردار: دە تۆ قەت نابی بە پاشا هههە.

بەهێز: سەردار زۆر خراپ حاڵیی بوویت، کەس ئاوات بەوە ناخوازێ لە گروپێکی لەیاسا دەرچوودا کار بکا، تۆ لێت تێکچووە، هەموو هاوڵاتیان لە خەمی گرتن و بەسزا گەیاندنی ئێوەدا بوون، نەک هیوا بە شووێنەکەتان بخوازن.. بەڕاستی زۆر خراپ تێگەیشتووی، هەر بۆیەشە دەستت نەپاراستووە.

سەردار: ڕاستە دەستم نەپاراستووە.. لەبەرئەوەی من لە جێگەو پلەیەکی باڵایا بووم.. کاک دارەوان ئەوەندە ڕێنوێنیی جوانی کردبووین، تا بزانین چۆن ئەژیین و بۆ ئەژین و ئەتوانین چی بکەین؟ زۆرجار ئەیوت:

<u>**بۆ فلاشباک:**</u>

________ گەڕانەوەی هەیە ______________ Cut ____________

دیمەنی – ١٠٣١ – فلاشباک – ڕ / د – باخی ڤێللای دەرەوەی دارەوان:

(( دارەوان و سەردار پیاسە یان لە شوێنێک دانیشتوون))

دارەوان: گوێ مەدەرە خەڵک سەردار، تا ئەوکاتەی توانایان هەیەو تۆ سوودیان لێوەرئەگریت، با خزمەتت بکا، کە کارت پێی نەما، تێیهەڵدە، هەروەکو ئەوەی هەر نەبووبێ.. هەرکەس بوو بە تەگەرە لەسەر ڕێگەت ڕایماڵە.. خۆت ئاسوودە بژی، هەقت بەسەر کەسەوە نەبێت.

سەردار: خوا ئەزانێ چەندت لەناوبردووە؟

دارەوان: ئیشی من ژماردنی ئەوانە نییە هاتوونە سەر ڕێم و لامبردوون.. من بەدوای نەمرییشدا ئەگەڕێم، هەر خۆم و بەس.. دوای من ئەبێ وابیت. ئەو خەڵکە پێویستیان بە دەرکەوتنێکی جیاواز هەیە.. تۆ لەبەرچاوی ئەوانا وا خۆت دەربخە دڵباش و میهرەبانیت.. کە هاتیە شوێنە ڕاستەقینەکەی خۆت، ئەوە بە کە من پێت ئەڵێم.. ئەو بیروباوەڕانەی ناو خەڵک (( ئاماژە بۆ دەرگای دەرەوە ئەکا، تەنەکە خۆڵێکی لێیە)) بخەرە ئا ئەو تەنەکە خۆڵەوە، نەکەی بۆ یەک ساتیش بگەڕێیتەوە سەری.. کە چوویتەوە دەرەوە، دەری بێنەو بیبەوە لەگەڵ خۆتا.. ئەوان ئاوا ڕام ئەبن.

سەردار: بەڵێ هەروا ئەکەم، سوپاس.

دارەوان: ڕەنگە تۆ بڕوا نەکەی چۆن کەسی نزیکی خۆشم لەسەر ڕێگەم لابردووەو هەر لە ژیانیش کردوومەتە دەرەوە، تەنها بۆ ئەوەی ئیشم مەیسەر بێ.

سەردار: ئەبێ کێ بێ گەورەم؟ با منیش بیزانم، تا ڕەحم بە کەس نەکەم.

Cut

<u>فلاشباک تەواو:</u>

دیمەنی – ١٠٣٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٣٠ –ژووری بەهێز:

(( هەمان دانیشتنی پێشوو))

بەهێز: پێی وتی کێیە؟

سەردار: بەڵێ گەورەم.. ئەوکاتە سەرەتام بوو، زۆر تاسام کەسێک بتوانێ ئەوە بکا.

بەهێز: ئەو نزیکەی دارەوان کێ بوو کوشتبووی؟

# ((ئەڵقەی پەنجا ))

سەردار: گەورەم باوک و برای نارەوەنی خێزانی.. چونکە هەردووکیان ناڕازیی بوون.

بەهێز: یەعنی جەناب بڵێ تۆش چاوت لەو کردو شۆڕشت کوشت؟

سەردار: گەورەم بەوجۆرەنەبوو.. دارەوان و ژنەکەی هەستێکی کەمیان بۆ یەکتر هەبوو، ئەگەر باوک و براکەی نەبوونایەو ئەوەیان ڕەت نەکردایەتەوە، هیچ ڕووی نەئەدا.. بەڵام من هەر ئەبووایە شۆڕش بکوژم.

بەهێز: بۆ؟ خۆ تۆ هەر داواشت نەکردبوو؟

سەردار: چونکە جگە لەوەی من هیچم لەگەڵ کچی شۆڕشا نەبوو، بەڵام ڕای شۆڕشم لەسەر بەشوودانی کچەکەی ئەزانی، کە چۆن وەک بەچکە پشیلە بە دانی هەڵیئەگرت و کوناو کونی پێ ئەکرد.. ئەو بە گەنجیش ڕازیی نەئەبوو، جا نەخوازەڵا من.

بەهێز(( نەرم)): ئێوە گروپێکی شێت و دڕندە بوون و زەڕڕەیەک ئەقڵتان لەسەرا نەبووە.. کەس هەیە لەسەر زەویدا تاوانی وا گەورە بکا؟

سەردار: بۆ وا گەرم بووی گەورەم، خۆ تۆ وا نەبووی؟ ___________ Cut ______

دیمەنی – ١٠٣٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە دانیشتووەو هەندێک نوسین لە کاغەزێکیترەوە ئەگوێزێتەوە.. هەندرێن بە ڕێزەوە لە بەردەمیا وەستاوەو دیقەتی دەستی ئەدا کە ئەنوسێ))

هەندرێن: ئۆو چەند باشی، هەر یەکەمینجارو پێویستیت بەکەس نییە هاوکارت بێ.

تریفە: باشیی من نییە کاک هەندرێن.. ئیشەکە خۆی ئاسانە هههها.

هەندرێن: وەڵا ئافەرین.. ئیتر بۆت ئەنێرم و هیج خەمم نییە.. ئێستا بە تەلەفون بە نارەوەن خانیش ئەڵێم چەند زیرەکیت.

تریفە(( بێ پەروا)): کورە شتەکە گەورە مەکەرەوە باشیی چیی؟ باوەڕ بکە بە هەموو کەسێک ئەکرێ.

هەندرێن: مەسەلەکە پارەیە پارە تریفەخان، یەک نوکە قەڵەمێک، زەرەری دنیامان لێ ئەداو جا یا پارە دیار نامێنێ، یان زیادی ئەبێت.. وا بە ئاسان وەریمەگرە.

تریفە: نا نا.. هەندێ دیقەت و وردەکارییە، هیچیتر.

(( شەنیا دێتە ژوورەوە، چاوەڕوانی تەواوکردنی قسەکەی هەندرێن ئەکا))

هەندرێن: توانای شت وەرگرتنت زۆرە.. دەستت خۆش، ئیتر ئاگاداربە.

(( سلاوی شەنیاو وەلام))

هەندرێن(( لە چوونە دەرەوەدا بۆ شەنیا)): هی ئەم مانگەشم بۆ ناردن، نارەوەن خان وتی مادام کاک ئامۆ بڕیاری لێداوە، مەیبڕن.

شەنیا: دەستتان خۆش سوپاس.

(( هەندرێن ئەچێتە دەرەوە))

شەنیا: من هاوڕێی دایکتم و ناوم شەنیایە، تۆش تریفەخانی کچی ئەویت.

تریفە: خۆشحاڵم بەڵێ ڕاستە.. فەرموو دانیشە.

شەنیا(( دائەنیشێ)): سوپاس.. بۆ نانخواردن لە کارگە هاتمە دەرەوە، کە بیستم جەنابت لێرەی، وتم ئەبێ کچی نارەوەن خان چ جوانێک بێ، با سەرێکی لێبەم.. لەسەروو پێشبینیمەوەی، گوڵەباخێکی بۆ خۆت.. خوا نەیبڕێ ئەو هەموو جوانییە!

تریفە: ئۆو سەرەڕای خۆت وا بە من ئەڵێی؟ سوپاسی لوتفت ئەکەم، ئەوە بۆ من زۆرە، خۆت شایانی زۆرترین وەسف کردنی.

شەنیا: کاشکای لای خەڵکی خۆیشی ئەو شانسەم هەبووایەو پەراوێزی نەخستمایە.. دەی لە دەمی تۆشەوە بیستنی خۆشە.

تریفە: هەر کەس بێت ئەو کەسە، هەڵبەتا کێشەیەکی لەگەل خۆیدا هەیە، ئەگینا چۆن ئەو هەموو نازارییەت نابینێ؟

شەنیا(( هەڵئەسێ و ئەچێتە لای مێزەکەیەوەو هەردوو لەپی دەستی ئەخاتە سەر مێزەکە)): ئەگەر ئامۆی براشت بێ؟

تریفە: ئۆو خۆزگە هەرکەسێکت بووتایە ئەو نەبێ.. بەڕاستی ئەو کێشەی لەگەڵ خۆشەویستیی و کچاندا هەیە.. دوای خۆشەویستە لە دەستچووەکەی.. دڵی ڕەنجاوەو ناتوانێ کەسی خۆش بوێ.

شەنیا: زۆر بە پەلە هەموو شتێکم وت، ببورە تریفە خان هههه.. من ئەوە ئەزانم و چیرۆکێکمان بەیەکەوە هەیە.. من داوات لێ ئەکەم، بێ ئەوەی دایکت و ئامۆو هەر کەسێکیتر بزانێ هاوکارم بیت، ئەگەر ئەو بەڵێنەم پێ ئەدەی نهێنییەکەمان پارێزراو بێ، کاتێکیتر بەمزووانە یەکتر ئەبینین.

تریفە: بۆ نا؟ بەڵێنت ئەدەمێ.

شەنیا: هەر بەڵێن نا.. ژمارەکەشتم بدەرێ با پەیوەندیت پێوە بکەم هههە.

Cut

دیمەنی – ١٠٣٤ –ڕ/د – ناو سەیارەی خدر:

(( خدر شۆفێرە.. نارەوەن لە سەکن))

خدر: بەهیچ جۆرێک لە باسی کارەکانی ناو ئەو کۆمپانیایەو شتی ڕۆژانەو نوکتە زیاتر، باسی هیچ شتێک لەو کۆمپانیایەدا ناکرێ.. بەهیچ جۆرێک دوای هاتنە دەرەوە نە تەلەفون بۆ کەس ئەکرێ و نە وەڵامی هیچ کەسێکیش ئەدرێتەوە، تا ئەگەنە شوێنی پارێزراوی خۆتان.. هیچ کەسێک نایەت بۆ سەردانیی کردنتان.. کاردانەوەتان هێمن ئەبێ، هەر شتێکیش ڕووبدا.. هەوڵی زانینی سەرچاوەی هیچ پارەیەک و هیچ کەسێک نادەن.. ئەمە فەرمانەکانی نەقیب ڕاهۆزە، ئەبێ وەک خۆی جێبەجێ بکرێ.

نارەوەن: باشە بۆ منیشی بنێرە نەک بیرم بچێ.

خدر: شەوێ بۆت ئەنێرم.

نارەوەن: دەی با ئێستا بچین نیناو ئاوا ببەین بەلایەکا پێکەوە بین، دایکی بمرێ سبەی ئۆغر ئەکا.

خدر: با دایکیشی بمێنێ و ئەویش ئۆغری سەلامەتیی بێت و پیرۆزیان بێ.

(( لە ڕۆیشتن بەردەوامە))

Cut

دیمەنی – ١٠٣٥ – ڕ/ د – دیوێکیتری چاپخانەکە:

(( ڕەووەز و ئەردەڵان پێکەوە وەستاون، بە شێوەیەکی ئاسایی وەک ئەوەی ڕەووەز باری هەبێت و پێی بڵێ))

ئەردەڵان: نا، حەمە خدرو نارەوەن خان ئەمڕۆ نەهاتوونەتەوە بە ئێرەیا، بەس کچێک هەبوو وا بزانم دەنکی ئامۆیان بوو، ئەو نیوەڕۆ هات و زوو ڕۆشتەوە.

ڕەووەز: نەتزانی ناوی چییە؟

ئەردەڵان: بەخوا نازانم شادیە بوو؟ شادیی بوو؟ یا شەهلا نازانم ناوێکی وا بوو، پێشتریش زۆر ئەهات.

ڕەووەز: ئێ ئێ ئەزانم.. تۆ چاو لەو ئۆفیسە ناتروکێنی ئەردەڵان.. هەرکەس هات و چوو، بە نهێنیی لە شوێنێکا بۆم بنوسەرەوە کەس نەیبینێ، نەک لە بیریشت بچێ.

ئەردەڵان: ئەوە بەڕاستتە کاکە ڕەووەز گیان؟ چۆن شتی تۆم بیر ئەچێ؟ هەمووشی ئەنوسمەوە لەبەر دڵی تۆ، بەسەرچاو.

ڕەووەز: ئیشێکیشت بۆ ئەدۆزمەوە بە بەردەوامیی زیاتر ئاگات لێی بێ و ئەم حەماڵییەت لەکۆڵکەمەوە.

ئەردەڵان: یەعنی چاکەت و پانتۆڵیش لەبەرکەم؟

ڕەووەز: ئەگەر حەزت لێی بێ، ئەویش لەبەرکە.

ئەردەڵان: هەر زۆر زۆریش.. قەت لە مەمنونیشت دەرناچم.

ڕەووەز: پارەو شتت پێویست نییە؟

ئەردەڵان: لەسای سەری جەنابتەوە، زۆر زۆرە، خوا دەست بە باڵی تۆوە بگرێ، ممنونم.

(( ڕۆیشتنی ڕەووەزو خواحافیزیی سازشکارانەی ئەردەڵان))

Cut

دیمەنی – ١٠٣٦ – ڕ/ د – بەردەمی دوکانێکی گەورەی چۆڵ:

(( تیرۆژو ڕاماڵ وەستاون و تەماشای دوکانەکە ئەکەن))

تیرۆژ(( دڵخۆش)): واو سۆ نایس مای لەڤ. دەستخۆش دەستخۆش.

ڕاماڵ: ئەمە ئۆفیسەکەی بێت و چاپخانەش لەجێی خۆی.. لە کرێکارەکانەوە دوور ئەبیت و ئێرەش ناو بازاڕە زووتریش ئەناسرێیت، هەرکەس ئیشی هەبوو بێت بۆ ئێرە.

تیرۆژ(( بە هەر دەستەو لایکێکی خێرا ئەکا)): لایک لایک، ڤێری گود.

ڕاماڵ: جا ناوی ئەنێی چی؟ با ئەمڕۆ فلێکس و لەزگەو تابلۆ کارەباییەکان بدەین بەکرد.

تیرۆژ: من باوکمم زۆر خۆشئەویست ڕاماڵ گیان.. حەز ئەکەم ناوی بنێم چاپخانەی دارەوان.. باوەڕ ئەکەی ئەویش زۆر شێتانە خۆشی ئەویستم؟!

ڕاماڵ: ئەی چۆن باوەڕ ناکەم؟ ئەی ئەوە نییە منیش شێتانە خۆشم ئەوێی هەناسە؟

تیرۆژ: کەواتە؟!

ڕاماڵ: چاپخانەی دارەوان.

(( تیرۆژ لە خۆشیا لە جێی خۆی هەڵئەبەزێتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٠٣٧ – ش/ د – باخیماڵی ئاکۆ:

(( ئاکۆو نیناو گێلاس))

گێلاس: ئیشەڵڵا پێ قدومی هاوسەرگیرییەکەتان خێر ئەبێ.. ئەوەتا هەر لەڕێوە من پارەی حەلاڵی خۆم دەست ئەکەوێتەوە.

نینا: هەواڵێکی زۆر زۆر خۆش بوو پورە گێلاس گیان، کەواتە من بە دڵی خۆشەوە سەفەر ئەکەم.. یاخوا هەر خێرتان بەسەرا ببارێ.

ئاکۆ: ئەی وەکالەتت بۆ پارێزەرەکە کردەوە؟

گێلاس: هەر یەکسەر، ئەی چۆن نایکەمەوە؟ من خواخوای ئەم ڕۆژەم بوو ئاکۆ گیان.

ئاکۆ: دە ژنەکە گیان ئەوە نیناش گوێی لێیە.. بەساقەوبم، دەدانیشەو وەلاهی تا مردن ئەو پارەیەمان بەسە...........

گێلاس: بەنیازی ئیش و کار نەکەم؟

ئاکۆ: با با ئیش و کار بکە.. ئەوە ئۆتێلەکەیە با هەر بمێنێ.. ئیتر ئەم پارەیە بخەرە لایەکەوەو مەیدە بە ئەرزا.

گێلاس: بۆ ئوتێلەکەش هەروات وت.. دڵنیابە بەقسەت ناکەم هههە.. من پرۆژەی دنیام لە مێشکایە.

ئاکۆ: من ئیتر وا قسەی خۆم کردو.. تۆش کەیفی خۆتە.

Cut

دیمەنی – ١٠٣٨ – ڕ/ د – باخیماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن ئەگری، تیرۆژو تریفەو ئامۆو ئاوا بێتاقەت.. خدر هێمن))

نارەوەن(( بەدەم گریانەوە)) دەی شەرتبێ بەیانی شۆفلێ بەرم ئەو گۆڕە نەفرەتییەی هەڵگێڕمەوەو هەر پارچەیەکی کەلاکە بۆگەنەکەی بۆ سەگێ هەڵدەم.

ئامۆ: ئەشهەدوو هەقی خۆتە.

ئاوا: ئاخر پیاو ئەڵێ ئێستا قسە بە باوکی خۆی ئەڵێ، توخوا ئەوە شایانی هەزار نەفرەت نییە؟ بەڵام ئەڵێی چی، تف هەڵدەی بۆ ئاسمان ڕووی خۆت ئەگرێتەوە.

تریفە: لەوەولاترچێ، هەرشەوەی گۆڕێ بناسێ.. باشە؟

نارەوەن: لێم بوەستن تا بەیانی، بزانن ئەهێڵم ئەسەری گۆڕیشی بمێنێ؟

خدر: هێمن بە نارەخان، هێمن بە، دڵی ئەو منالانە سەغڵەت مەکە.. تازە شتەکە پێش زیاتر لە سی ساڵ ڕوویداوەو تێپەڕیوە. بۆ ئەمڕۆ گەرمی مەکەنەوە.

نارەوەن: کورە خەریکە شێت ئەبم خدر گیان، من زیاتر لە ٣٠ ساڵە ژنی دڕندەو خوێنڕێژێکی گەورە بووم و ئەو منالانەم لێ خستۆتەوە، ئاخر من چووزانم بکوژی باوک و براکەم بووە، چووزانم!!!!!!!!!

ئاوا(( ئەچێتە لای نارەوەنەوەو لە پشتەوە دەست ئەکاتە ملی)): تۆ چی ئەڵێی با ئەوە بکەین نارە گیان، هەر تۆمان بۆ خۆش بی تازە هیچ دەسەڵات نییە.

نارەوەن(( گریان)): هیچم ناوێ، تا خوا بەیانی ڕۆژ ئەکاتەوەو ئەگەمە سەری.

خدر: ئەوە تۆڵەیە لە شتێکی بێ گیان و بێدەسەڵاتییە با بزانی.. ئەوەی ئێستا هەیە گرنگە، ئەو کوڕو کچانە بە برژانگی چاو تۆ خزمەت ئەکەن، من ئاگام لێیە چیت بۆ ئەکەن.. دڵی ئەوان مەشکێنەو واز لە داروپەردووی گۆڕیش بێنە، هیچ ناگۆڕێ.

نارەوەن: چی بکەم داخی دڵمە.

ئاوا: نەوەڵا داخی دڵت نییە، ئەڵێی بەیانی کوڕەکە سەفەر ئەکا با بە دڵتەنگیی بڕوا.

نارەوەن: نا وەرە بەساقەوبم، دڵم گەرمە ئاوا گیان، خۆم پێ نەگیرا چی بکەم.

ئاوا: تا ئەم باسە دائەخەنەوە، من ئەچمە ژوورەوە.. ئەگەر هەر بە خاپورکردنی گۆڕەکەی سوکناییت دێت، مەچۆ بەلایاو بەیانی دوو سێ کەسی بۆ ئەنێرم بیکەن بەبیری زێراب(( ئەچێتە ژوورەوە))

تیرۆژ: هەرچییەک بێ لە پێناوی تۆیا ئەوەی کردووە.. بۆئەوەی تۆی دەستکەوێ.

نارەوەن: دەمت داخە بەچکە سەگ، ئەزانم ئێستاش خۆشت ئەوێ. (( تیرۆژیش ئەچێتە ژوورەوە بە خێرایی))

خدر: تکایە تکایە نارەوەن خان ئەم کوڕو کچانە گوناهیان چییە کە بەبێ خواستی خۆیان کوڕو کچی تۆو ئەو بوون.. بەڵام خۆ پێشتریش ئەمەی پێ وتبووی، ئێستا بۆ وا ئەکەی؟

نارەوەن(( شپرزەو توڕە)): ئەمەی پێوتبووم، کە باوەکوشتەو برا کوژمە؟ کەی؟

خدر: کاتی پێش لە سێدارەدانی پێی وتبووی تاوانی زۆر گەورەم لەگەڵ کردووی، دواتر پێی ئەزانی.. ئەبێ ئەمەش بە ئاسایی وەربگریت و چاوەڕوانی تاوان و کەتنی تریشی بکەی.

نارەوەن: جا تاوانی وا گەورە؟ بۆ ئەمە تاوانە یان وەحشیەت؟

خدر: ئەویش کەمی پێ نەوتووی، پێی وتووی تاوانی گەورەم دەرهەق کردووی.

Cut

دیمەنی – ١٠٣٩ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و ڕەوەز دانیستوون بەرامبەر))

ڕەمزی: بەڵێ من ئەیانپارێزم.. بەڵام وەک ئاوا ئەڕوا، لەم کاتەیا هیچ بەرپرسیارێتییەک لەسەر ئەو نییە، ئەکەوێتە سەر شانی تۆ.. تۆش هەروەکو ئیشەکانیتری جاران، تا ئەو دێتەوە ئەو گواستنەوانە ڕێکخە کە ئیشی خۆمانی تیا بکرێ.. چەندی پێ ئەچێ؟

ڕەوەز: ٢٠ ڕۆژ.

ڕەمزی: بیست ڕۆژ زۆرە تۆ ئەتوانی سێ کاروانی باشی تیا بگەیەنیتە دەستیان.. بۆ ئێستا ئەوە زۆر باشە.

ڕەوەز: سێی چی؟ هەوڵی زۆر زیاتر ئەدەم، بە پێی داخوازیی ئەوان.

ڕەمزی: زۆر باشە چاک ئەکەی.. منیش بیرۆکەیەکم بۆ حەمە خدر هەیە، ئەگەر ئاسان نەهاتە پێشەوە خۆت بۆم فتکە.

ڕەوەز: هەه ئەو ئەردەڵانەی پێکەوە حەماڵییان کردووە، وا دەرئەکەوێ هەر زۆر ڕقی لێی بێ کاک ڕەمزی.. هەر بەویشی لەناو ئەبەم هەرکاتێ خۆت فەرمانت کرد.

ڕەمزی: متمانەی هەیە؟

ڕەوەز: گەورەم بۆ پارەی قەبە برای خۆیت بۆ ئەکوژێ، هەر باکیشی نییە.

ڕەمزی: دەی مادام ئەو دەسکەلایە هەیە.. بابزانین کاردانەوەی خدر چۆن ئەبێ.. ئەوە زۆر باشە، با هەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٠٤٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو زوبێر دانیشتوون کەمێک گرژن))

زوبێر: من پێموتی تا ئەو کچە لەسەرماڵ بێت، خۆمان دەست پێ نەکەین باشترە.. گوڵەکەم ئەمە دۆخێکی تازەو لەپڕە بۆ ئەو کچە، ناتوانێ بە ئاسانیی هەرسی بکا.. گەر لەبەر خاتری ئێمەش قبوڵی بکا، دواتر بە شێوەی ناوەکی و لە بیانووی جیاوازدا ئەتەقێتەوە.. بەڕای من سترێسی زیاتری نەخەینە سەر.

نیگار: نا خۆ هیچی نەوتووە، هەر ئەڵێ با لە خانووەکەی خۆمانا بین خۆشترە.. ئەگینا خوا هەڵناگرێ زۆری پێخۆشە.

زوبێر: بەڵام ئەگەر سبەی دوو سبەی کەسێک بێتە پێشەوەو هاوسەرگیریی لەگەڵ بکا، ئەوسا ماڵی خۆی خۆشتر ئەبێ نەک ماڵەکەی تۆ.. کەواتە ئەمە بیانووە. وایە؟

نیگار: نا زوبێر گیان، ئەگەر بە ڕاشکاویی قسە بکەین، ئەبێ بیری ئەوەشت هەبێ کە ئێستا ئەم هەست بەوە ئەکا بۆ ماڵی باوەپیارە ئەگوێزرێتەوە نەک ماڵی خۆی.. ئەوە جیاوازییەکەی هەر زۆر زۆرە.

زوبێر: ڕاستە جیاوازە.. بەڵام بە ڕای من جارێ دەستی لێنەدەین، تا دەروویەک ئەکرێتەوەو بزانین بە کوێ ئەگا.. بەڕاستی منیش دڵم نایەت مناڵەکان لەو گەڕەکەیا تەنیاکەم و دواتر خەڵک بڵێن بۆ ژن پشتی کردە مناڵ، بەڕاستی لەو تەمەنەیا نەماوم ئەو قسانەم شوێن بخرێ.

نیگار: نا نا.. ئەمەیان لە بیانوو ئەچێ زوبێر گیان پێت ناخۆش نەبێ، جا خەڵک چی ناڵێن؟ دوای ئەوە ئەو قسەیە ئەخرێتە شوێن گەنج نەک دوو بەساڵاچووی وەک من و تۆ.

زوبێر: باشە قسەی تیا ئەکەینەوە هەوڵ ئەدەم چارەسەرێکی بۆ بدۆزمەوە هەموو لایەکمان پێی ڕازیی بین. (( ڕازیبوونی نیگارو خواحافیزیی و ڕۆشتنی زوبێر))

Cut

دیمەنی – ١٠٤١ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری دانیشتوون))

ئاری: خۆ تەواو هیچی نەما؟

بەهێز: بەڵی، دادوەریش ناردونی بۆ دادگای بابەت.. سا خوایە بە زووترین کات فەرمانی لە سێدارەدانیان بۆ دەرچێ، گروپی وا پیس و شێرپەنجەی وام لە هیچ وڵاتێکیشدا نەبیستووە.. ئەهـ کە مەترسیدارو دڕندەن.

ئاری: بە دڵنیایی گەورەم هەر بە ڕاست ئەمانە شێت و تینوی خوێن بوون.

بەهێز: باوەڕ مەکە هیچ خوێنڕێژو تاوانبارێکی دەرهەق بە خەڵک، بۆی بلوێ و بۆی بچێتە سەر.. یاسا گەر نوشوستیش بهێنێ لە ماوەیەکدا، ڕوحەکەی هەر زیندووەو کەس ناتوانێ لێی دەربازبێ.

ئاری: بەو هیوایەی خەڵکیش وەک ئێستا بەردەوام هاوکاری یاسا بن.. بە ڕاستی ئەو کاک حەمە خدرە ئازایەتیی زۆری نواند.

Cut

دیمەنی – ١٠٤٢ – ڕ/ن - ئۆفیسی وەکالەت:
(( تریفە شت ئەنوسێت و زەنگی بۆ دێت))
تریفە: ١- بەڵێ گیان......... ٢- سوپاس گەر ئێوە باش بن، باشم......... ٣- ئەمرکە گیانە! ....... ٤- ناوەڵا ببورە شەنیا گیان، برایەکیترم بۆ مانگی هەنگوینیی چوونە دەرەوەی وڵات و دایکم کەمێک بێتاقەتیەتی، ناتوانم جێی بهێڵم، زۆر ببورە بۆ کاتێکیتر ئیشەڵڵا............ ٥- وەڵا خۆ ئیتر دایکەو چووزانم ڕەنگە مەکر بێ و ڕەنگە نارەحەتی دوورکەوتنەوەکەشی بێ، ئاخر ماوەیەکی زۆری پێ ئەچێ............ ٦- با بزانین چۆن ئەبێ گیانەکەم.. هەوڵ ئەدەم........... ٧- نا ئاساییە چاوەکەم.. خوات لەگەڵ.
(( مۆبایل دائەخاتەوە))
Cut

دیمەنی – ١٠٤٣ – ڕ/ د – بەردەمی کارگەی نیگار:
(( ڕەمزی بە دیار شەنیاوە وەستاوە کە زەنگ بۆ تریفە ئەکا))
شەنیا: ١- گیانت خۆش گوڵەباخ، تۆ باشیت؟ ...... ٢- زۆر سوپاس وەڵا باشین........ ٣- ئەڵێم ئەگەر ئەم ئێوارەیە کاتت هەیە، پێکەوە بچینە دەرەوەو نانێک بخۆین و دەردەدڵێکت بۆ بکەم ....... ٤- جا ئەوان بۆ گەشت و گوزار ڕۆشتوون و مانگی هەنگوینییە، چ پێویست بە بێتاقەت بوونی دایکت ئەکا.. یان مەکرتان بەسەرا ئەکا ........ ٥- دەی باشە گوڵی گیان، دوو سێ ڕۆژیتر پەیوەندیت پێوە ئەکەمەوە، بەو هیوایەی خەمی دایکت ڕەوییێتەوەو ئیزن وەرگرتنت ئاسان بێ ............ ٦- ببورە لەم کاتەشدا تێلم کرد، ڕەنگە ناوەخت بێ.. کاتی خۆش گوڵەباخ گیان.... ٧- خوات لەگەڵ. (( مۆبایل دائەخاتەوە))
شەنیا (( بۆ ڕەمزی)): بەدڵت بوو؟
ڕەمزی: باشە خراپ نییە، هەست ئەکەم ئەتوانێ کار بکاتە سەر ئامۆ.
شەنیا: ئیتر با بزانین چۆن ئەبێ.
(( چوونەوەیان بۆ ناو کارگە))
Cut

دیمەنی – ١٠٤٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی تازەی خدرو نارەوەن:

(( خدر ئاسایی و نارەوەن کەمێک گرژە دانیشتوون.. خدر بە ئاماژە پێی ئەڵێ سەروچاوی نەدا بەیەکا و نارەوەن هەوڵ ئەدا پێبکەنێ یان خەندە بکا.. دیدەوان دێتە ژوورەوە، نارەوەن ڕووی ئەکرێتەوە))

دیدەوان: سڵاو لە دوو جوانترینی سەر ئەرز.

(( وەڵامدانەوەی ئاسایی نارەوەن و خدر))

خدر: سوپاس بەڵام من نا ڕەنگە نارەوەن خان بێ ئەوەی ئەیڵێی، چونکە من بە منداڵی دایک و باوکم دەریانکردم وتیان حەیات بردووین ئەوەندە ناشرینی (( پێکەنینی هەرسێکیان))

دیدەوان: نا نا کەمێ غەدریان لێکردووی یەگجار ئەوەندەش ناشرین نیت.

نارەوەن: یەعنی خۆی ناشرینە، بەڵام تا ئەو ڕاددەیەش نا دەربکرێ؟ هههەه.

دیدەوان: ئا ئا ناشرینییەکی جوانی تیایە، من حەزم ئەکرد وا بوومایە.

نارەوەن: دەی ئەوە خدر وا.. باوەڕ بکە منیش لەبەر ناشرینیی لە مەکتەب فەسڵیان کردم.

خدر((پێکەنین)): منیش شایەتم! ههه

دیدەوان: ئەک کوێراییان دایێ باشە، چۆن دڵیان هاتووە ئەوە بکەن؟

خدر: تازە دڵیان هات و بڕایەوە، ڕەنگە خزمانی تۆش بووبن، لەبەرئەوە تۆزێک باوەڕکردن زەحمەتە خاڵە دیدەوان هههەه.

دیدەوان: منیش باوەڕکردن و نەکردنی تۆم لا مەبەست نییە، گرنگ نارەوەنی گوڵە.. تۆ باوەڕم پێ ئەکەی گوڵە گیان؟

نارەوەن: جا کە خدر باوەڕت پێ نەکا، ئەوە من هەر نەو. هههەه

دیدەوان(( سوعبەت)): دیارە پێکەوە ڕێککەوتوون سەر بکەنە سەرم.

خدر: نا ڕێککەوتن نییە خاڵە دیدەوان، خۆی دروست بوو هههه.

دیدەوان: تۆ ئەو خاڵەیە لابەرە، هەر کاک دیدەوان و تەواو.

خدر: بەسەری تۆ خاڵە دیدەوان تازە زمانم وا پژاوە تەرک ناکرێ.

دیدەوان: ئێوە کەڵکی قسەتان نییە.. من بۆ ئەوە نەهاتووم.

نارەوەن: ئەی بۆچی هاتووی خاڵە دیدەوان گیان؟

دیدەوان: کچێ تۆ هەر خاڵەکەش لابەرە، چۆن بانگم ئەکەی بانگمکە.

نارەوەن: من حەز ئەکەم پێت بڵێم دیدە، خۆ ڕازیت؟ ئەها چەند گەنجت ئەکەمەوە؟ لە خدریش منالْتر، ئیتر چیت ئەوێ؟

دیدەوان(( دەستێک بە ڕیشیا ئەهێنێ، وەک بڵێ من ئەوەم؟)): باشە کاکە گیان ڕازیم.. ئەوە کاک ڕەمزی تەلەفونی کرد، وتی بڵێ ئێوارە دەعوەتی منن.

(( خدرو نارەوەن سەیری یەک ئەکەن و وەڵام نادەنەوە))

دیدەوان: لەگەڵ ئێوەم بوو، وتتان چی؟

نارەوەن: دیدە بە کاک ڕەمزی بڵێ داواکەت قبوڵ نەکراو ڕەتکرایەوە.

خدر: لەبەرئەوەی بۆ دەعوەت، بە دەعوەتکراو ئەوترێ، نەک کارمەندی بەردەستیان.

نارەوەن: ئا، پێی بڵێرەوە، هەر دەعوەتێکیتریشمان بکات و خۆیشی بێت بە شوێنمانا، تازە دەعوەتی ئەو وەرناگیرێ.

دیدەوان: دەی بواری منیش بدەن شتێک بڵێم!

خدر(( تورە)): دیدە!! ئەڵێم بگەڕێوە ژووری خۆت، زۆر لێرە ناوەستی، تێگەیشتی؟

دیدەوان: جەنابت ئەمرەکەی کاک حەمەخدر، بەڵام کاک ڕەمزی پێی ناخۆش ئەبێ.

نارەوەن: کەیفی خۆیەتی، پێی بڵێ ئسوڵی دەعوەت وا نابێ.

دیدەوان: من ئەوە ئەگەیەنم کە ئێوە وتتان.

خدر: ئاگاداری سنوری خۆشت بە نەیبەزێنی، تۆ ژمێریارێکیت لێرەو هیچیتر، پێت لار دابنێی ئەتگۆڕم و کەسێکیتر ئەخەمە شوێنەکەت.

دیدەوان: هیچی هەڵەم کرد کاک حەمەخدر، تا وا بڵێی.

خدر: ئیتر من وا ئیش ئەکەم، دەمەدەمم پێخۆش نییە، هەرچیموت جێبەجێی ئەکەیت و ئەویش تەنها لە کارەکەی خۆتا.

دیدەوان: بەسەرچاو،

(( ڕۆشتنی دیدەوان، خدرو نارەوەنیش دەست بە دەمیانەوە ئەگرن و پێئەکەنن، دواتر نارەوەن گرژ ئەبیتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٠٤٥ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەوەز دانیشتووەو ئەوراق هەڵئەداتەوە، گوڵزار دێت بۆ لای، سڵاوی گەرم و هەستان لەبەرو وەڵام))

ڕەوەز: باش بوو هاتی.

گوڵزار: کاک ڕەمزی ناردمی، وتی ئیشی پێتە.

ڕەوەز: ئا بەساقە، ئەمڕۆ تازە درەنگ بوو، سبەی شەبەقیی دەرئەچی بۆ سەرمەرز.. کابرا ئەبینیتەوەو ڕێ و شووێنی تەواو دابنێین بۆ کاروانێکیتر.

گوڵزار: بەسەیارەی خۆم بچم؟

ڕەوەز: نا لەگەڵ کەسێکا بچۆ.

گوڵزار: شەنیا بەرم؟

ڕەوەز: نا کوڕ بێ باشترە. شەنیا وا ڕێکنەخراوە.

گوڵزار: کورە خەمت نەبێ هەر زۆر سازە.. بەڵام باشە مادام کوڕ بێ، زاهید باشترە.

ڕەوەز: ئا ئەو باشە.

گوڵزار: من ئەڕۆم خۆت هیچت پێویست نییە؟

ڕەوەز: سوپاس، هەر ئەوەو هیچیتر.

(( چوونە دەرەوەی گوڵزارو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١٠٤٦ – ڕ/ن – ناوکارگەی نیگار:

(( ڕەمزی و شەنیا بەدیار ئیشەوە، کرێکار دووره لێیانەوە))

ڕەمزی: ئۆفیسەکە چۆڵ ناکا.

شەنیا: دڵتەنگیش دیارە، لەوە ئەچێ لەگەڵ کاک زوبێرا تەواو نەبن، ئاگات لێ نییە هەر جرت و فرتیەتی؟

ڕەمزی: هەه ئاخر بۆیە لە پیرییا ژن بێنی خراپە، دڵ ناسک ئەبێتەوەو کەس تەحەمولی کەس ناکا.. من حەز ناکەم سەربگرێ.

شەنیا: پەیوەندی بە منەوە نییە کەیفی خۆیانە.

ڕەمزی: ڕاستە.. چاویان دەرئەهات.. ئەمانەتەکەی کاک دارەوانیش گەیشتە کچەکەی.

شەنیا: کەواتە قەرزی کەسمان لەسەر نەماوە.

ڕەمزی: زۆر ئەترسام بمرم و ئەو ئەمانەتە نەگا، لە دوای خۆم دڵنیا نەبووم.

شەنیا: لە منیش.

ڕەمزی: گرنگ ئەوەیە تەواو، قسە کردن لەسەر ئەوە کەمێکی زیادە، ئەگەر هەمووی نەبێ.

شەنیا: خۆ ئەزانم ئەو هەموو متمانەیەم پێ ناکەی بۆ هەموو شتێک.. بەڵام ڕەنگە زۆر نەخایەنێت، ئەوسا بزانی شەنیا چ دەستپاک و ئەمانەت پارێزێکە.

ڕەمزی: پێتەوە دیارە.

Cut

دیمەنی – ١٠٤٧ – ڕ/د – بەردەرگای ئۆفیسی چۆڵ:

(( لە بەردەمی ئۆفیسەکەدا پەیژەو دوو کرێکار هەیە، قطعەیەک لێی نوسراوە " چاپخانەی تیرۆژ" دانراوەو ئامادەیە بۆ هەڵواسین.. تیرۆژو ڕاماڵ وەستاون، تیرۆژ تەماشای قطعەکە ئەکا))

ڕاماڵ: بە دڵتە؟

تیرۆژ: زۆر جوانە، خۆزگە هەر ناوە کۆنەکە بووایە.

ڕاماڵ: ئەی بۆ پێت گۆڕیم بۆ تیرۆژ، من حەزم نەکرد ناوی خۆت بێ.

تیرۆژ: هەر لێیگەڕێ، تاقەتی کێشەم نییە.. ئەمەش خراپ نییە.. چاپخانەی تیرۆژ.

ڕاماڵ: کەی ئەیکەیتەوە؟

تیرۆژ: بە ڕێ و ڕەسمی تایبەت ئەیکەمەوە، پەلەمان چییە؟ با ئاواش بێتەوە.

ڕاماڵ: زۆر زۆر باشە.. منیش تا ئەوکاتە تەواو ناوماڵ پڕ ئەکەمەوە.

تیرۆژ: زۆر چاکە.. دەبا دەست پێ بکەن.

ڕاماڵ: دەی برایان هیممەتکەن.

(( کرێکارەکان و ڕاماڵ دەست ئەکەن بە ئامادەکردن بۆ هەڵواسین و تیرۆژیش تەماشا ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٠٤٨ – ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( ڕەمزی دێت بۆ ماڵی نارەوەن، نارەوەن و تریفەو تیرۆژو خدر بەخێرهاتنی ئەکەن و تیرۆژو تریفە ئەچنە ژوورەوە ))

ڕەمزی: ئەرێ ئەوە ئیش وائەکرێ، خۆتان لە کەس نەگەیەنن؟

خدر: کاک ڕەمزی خۆت ئەزانی ئێمە پرکارین و ئەم ئیشەشت بە جۆرێک بۆ خستینە ڕوو، کە ئێمە سوودمەندی ماددی بین تیایاو جەنابیشت مەعنەویی، بەوەی سوود لە شارەزایی ئێمە وەرگری.. وا ئەزانم ئەم ڕێککەوتنەمان بەس بێ بۆ ئەوەی ئێمە خاوەن کارەکە بین و جەنابیشت تەنها ئەرکی هەوڵدانت لەسەرە بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتیی بەڕێوەچوونی کارەکە.

نارەوەن: هۆکاری پێکەوە کارکردنمان ئەوەبوو.. ئێمە هەرگیز شەق لە ڕسقێک نادەین بە پاکیی هاتبێتە بەردەستمان.. بەوەش هەق بە ئێمەیە ئەگەر لێت نەپرسینەوە، چونکە سەرقاڵی کاری خۆمانین.. ببورە ئەوە جەنابتی کە ئەبێت سەردانیی بەردەوام بکەیت و هەوڵ بدەی بزانی ئێمە چۆن ئیش ئەکەین، بۆ ئەوەی دوای کۆتایی هاتنی ڕێککەوتنەکەمان، کۆمپانیاکەت وەرگریتەوەو بشزانی چۆن بەڕێوەی ئەبەی.

خدر: ئیشی ئێمە بۆ ماوەی ساڵێکەو ئەگەر ئەتوانی وا هەڵبکەی لەگەڵمانا، ئەوە ئێمەش درێغیمان نەکردووە.. گەر ناشتوانی ئەوە غەرامەی پاشەکشەکەت ئەدەیت و هەرکەس لە ماڵی خۆی.

ڕەمزی (( پێکەنین )): هیچێکی ئەوتۆم نەوت و ئێوە زۆر بە خێرایی هەندێ شتتان بۆ یەکتر ئەوتەوە، کە هیچ پێویستی نەئەکرد.

خدر: نا قوربان، ئێمە تێگەیشتین لە خاڵە دیدەوە قسە ئەکەی، کە ٤ ڕۆژە خۆی تۆراندووە.

نارەوەن: دیدە گیان ڕوحە ڕوح، نازانین بۆ ڕۆشت؟ خۆ زۆر ڕوحسووک بوو.

ڕەمزی: من نازانم لە کوێوە لەگەڵ ئێوەیا دەست پێ بکەم؟ بهێڵن با قسە بکەم.

(( تیرۆژ چایان بۆ ئەهێنێ یا شتێکیترو دەستخۆشیی و ئەگەڕێتەوە))

نارەوەن: فەرمووو قسە بکە.

ڕەمزی: کاک دیدەوان پیاوێکی ئەوەندە بەڕێزە، خەڵک دەستی بۆ ڕائەگرێ بەسەریا بڕوا، شایانی ئەو سوکایەتیی و پێڕابواردنە نییە کە ئێوە پێتان کردووە.

خدر: ئەو کابرایە...........

ڕەمزی(( قسەی پێ ئەبڕێ)): مەجال بە برا.. ئەوەی تۆ پێی ئەڵێی کابرا، پیاوێکی نەجیبی ئەم شارەیەو خەڵک ئەزانێ چەند خزمەتی بە خەڵکی ئەم شارە کردووەو چۆن لە هەر شوێنێک ئیشی کردبێ جێ دەستی دیارەو مایەی پێشکەوتنی ئەو شوێنە بووە.. ئەو پیاوە تەنها عەیبێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە زۆر دۆستی هەژارەو بە هانای برسیی و لێقەوماوانەوە ئەچێ.

ـــــــگەڕانەوەی هەیە ـــــــ تابع ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٠٤٩ – متبوع – ش/ن –ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ دێتە ژوورەوە بۆ لای تریفە لە هۆڵەکە دانیشتووە))

تیرۆژ: ئەم دایکەشم شتی وا ئەناسێ، نازانی چی بڵێی!

تریفە: بۆ؟ ئەڵێ چی؟

تیرۆژ: کچێ چوزانم، زۆر لە خۆبایی و تورەهات دیارە، (( لاسایی ئەکاتەوە)) ئاوا قسە ئەکا (( بەلاساییەوە دەمولوتی ئەدا بەیەکا)) نابێ ئێوە بەو کابرایە ڕابوێرن.

تریفە: هههه کابرا کێیە؟ دیارە دایکە ساختەچییەکەمان حەشری پێ ئەکا.

تیرۆژ: دەستی خۆش بێ، خۆزگە بەمەشی ڕائەبوارد، دیارە زۆر لەمە هیچیترە بۆیە پێی ڕابواردووە.

تریفە: بەخوا دایکیشم جەوی هەبێ باش خەڵک کەللەیی ئەکا.

تیرۆژ: من ناچمەوە بۆ پیاڵەکان تۆ بچۆ.. تاقەتی ئەو سەرو فەسساڵەم نییە.

تریفە: کچێ دە دەی ئێستا ئەڕوا.. هەر یەک جارە.

تیرۆژ: کەمێ ماندووم تریفە گیان، ئەچم ڕائەکشێم.

تریفە: ئەزانم بەقوربان ئەزانم.. چی بوو تەواو ناوت نا چاپخانەی تیرۆژ؟

تیرۆژ: ئا، لەبەر دایکم گوناحە.

تریفە: وەی بەساقەی ئاقڵیەکەت بم تیرە گیان.

(( تیرۆژ ئەچێتە ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ١٠٥٠ – ش/ن – گوند – ماڵی باوکی خدر:

(( هەرمێ لەناو جێدا ئەگری، دواتر هەڵئەسێ و تەنگە نەفەس بووە، هەناسەی قوڵ هەڵئەکێشێ و باوکی خەبەری ئەبێتەوە چراکان هەڵئەکا.. دەنگی دەرناچێ لە قسە کردناو ئاماژەش بەکار ئەهێنێ))

باوک(( ئاماژە و لیپسن.. پەرۆش)): چییە ئەوە بۆ ئەگریت؟

هەرمێ: بیری کاکم ئەکەم خەریکە شێت ئەبم.

باوک: خەوت پێوە بینی؟

هەرمێ: ئا خەوم پێوە بینی، لە خەوما بەناو چنارەکانی چەمەکەدا ڕۆشت و هەرچەند بۆی گەڕام نەمئەدۆزییەو دەنگیشیم گوێ لێ نەبوو.. کەچی دووایی ئەبینم یاریم لەگەڵ ئەکاو بە ماتەمات لەپشتمەوە دوام کەوتووە.. باوکە زۆر بیری ئەکەم زۆر زۆر.

باوک: بە تەلەفون.

هەرمێ ئەو ژمارەیەی لای منە دایخستووە.

باوک(( دەست ئەدا بە یەکا)): ئەی چارەسەر؟

هەرمێ: بەخوا خۆم بۆ ناگیرێ، بە کێوانی سایەق ئەڵێم هەوڵ بدە بیبینی و پێی بڵێ سەرێکمان بداتەوە، بەخوا نەیەتەوە، خۆم ئەچم.

Cut

دیمەنی – ١٠٥١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٤٨- ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

خدر: هەر کەسێک بێ بەلای منەوە گرنگ نییە بەقەدەر ئەوەی بتوانێ ڕێزی خۆی بگرێت و بزانێ لای من سنوری خۆی تا کوێیە.. نەک خۆی بە خاوەنکاری ئێمە بزانێت و موغازەلەی نارە خان بکا لە بەرچاوما کە وەک دایکم وایە.. ئەگەر تۆش ناردبێتت بۆ ئەوەی لە ئیشی ئێمە شارەزا بێت، هەر شایانی پێڕابواردنە کە بەو جۆرە مامەڵە بکا.

ڕەمزی: ئەها.. تێگەیشتم تۆ لە موغازەلەکەی پەستی.. بۆ منیش گرنگ نییە نارەوەن خان دایکتە یان هەر شتێکیتری تۆیە.. ئسوڵ وایە پیاو ئەبێ بە وشەی جوان و چەپکە گوڵەوە پێشوازیی ژنان بکا.. ئەگەر تۆ ئەمە بە موغازەلە بزانی، بەهەڵەدا چوویت، ئەو پیاوە لە ژیانی شارنشینیی باش تێ ئەگا.

نارەوەن: شار نشینە تێ ئەگا یان تێ ناگا، کێشەی ئێمە نییەو سنورێک هەیە ئەبێ بیزانێ و خۆی نەکا بە قەشمەر.. ئەو لە هەموو حاڵەتێکدا تەنها ژمێریارەو هیچیتر.. دوای ئەوە کاک ڕەمزی ئەو شێوازەی جەنابت لە چاوسوور کردنەوەو لێپرسینەوە ئەچێت، بە ڕاستی قبوڵکراو نییە.. ئەبێ هەر یەکەمان بە جوانیی لە ئیشی خۆی گەیشتبێ.

خدر: ئێمە بەرپرسی یەکەمی ئەو شوێنەین و بە کۆمپانیای خۆمانی ئەزانین بۆ ماوەی یەک ساڵ و کەسیش بۆی نییە دەست لەکارمان وەربدات.. ئەمەش بە پێی ڕێککەوتنەکەی ئیمزامان کردووە.

ڕەمزی: ئەه ئەوە ڕاستە.. بەڵام داوایەکم هەیە لەبەرچاوی دۆست و ناسیاوم مەمخەنە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە، بەوەی وا دەربکەوێ سووکایەتی بە کاک دیدەوان کراوەو منیش لە ئاستیا بێدەنگ بووم.. پێشنیاز ئەکەم بگەڕێتەوەو ژمێریاریی خۆی بکات و کەسێکیتر ئەنێرم بۆ شارەزا بوون لە کارەکەتان، ئەو نەیەت بە لاتانا، خۆ بەپێی ڕێککەوتنەکە هەقی ئەوەم هەیە کاک حەمەخدر؟

خدر: بەڵێ چەند کەس ئەنێری بینێرە، بەڵام لەژێر ڕکێفی ئێمە دەرنەچن.

ڕەمزی: زۆر باشە ڕێککەوتین.. بابەتێکیترمان هەیە سەبارەت بە گواستنەوەو هێنانی پێداویستیی پزیشکیی بۆ نەخۆشخانەکەی کاک زوبێر، وا ئەزانم ناسیاوی نزیکتانە.

نارەوەن: بەڵێ برای گەورەمانە.

ڕەمزی، زۆر باشە ئەتوانین لەگەڵیا ڕێکبکەوین بۆ ئەوەی ئەو پێداویستیانە دابین بکەین؟

(( وتووێژ لە میوتیدا ))

Cut

دیمەنی – ١٠٥٢ – ش/ د – باخی قاوەخانە:

(( زاهیدو گوڵزار))

گوڵزار: ئێ باشە بە جلی کوردییەوە دێم.. هههە. کوڕی نازانم چییەکە، خۆ بۆ شایی ناچین.

زاهید: بێ ئەقڵ شایی نییە، بەڵام مەبەستەکەی من ئەوەیە ئەگەر شتێکی بچوکمان بۆ ڕێگە دەستکەوت نۆشیکەین.. جلە کوردییەکاننت لە پشکنین ڕزگارمان ئەکا.. وەک ژن و مێرد دەرئەکەوین و تایبەت دەرناکەوێ.

گوڵزار: هەتیو تۆ زۆر ترسنۆکی.. فشەیە فشە.. ئێستا سەیتەرە هیچ ناکا کوڕو کچێکی گەنج ئەپشکنێ، وا نا؟

زاهید: ئەرە وەڵا هەر تیلە چاوێکی بە جۆرێکیان بینی مۆخ و ئێسقانمان ئەسوتێنن.. من شارەزای ئەو ڕێیەم، تۆ ئاگات لێی نییە.

گوڵزار: منیش دەجار زیاتر چووم و شتی وام نەبینیوە.. جا با نۆشی نەکەین ئەمجارە، کە هاتینەوە، نابێ؟

زاهید: ئێ باش بە دڵی تۆ.

گوڵزار: با بزانین کاروانەکە چەند کیلۆییە ب جاری داهاتوو، کێ لێمان وەرئەگرێ و بە کێیا ئەینێرێتەوە، ئەوسا قسەیەکی لێ ئەکەین.

زاهید: بۆ جەناب تا ئێستا پێی نەوتووی؟

گوڵزار: نا.. وتی شەو ئەتدۆزمەوەو وردەکارییەکانت پێ ئەڵێم.

زاهید: ئەی بۆ تەلەفونی بۆ ناکەی؟

گوڵزار: چییە منت لە زیادە؟ ئەتەوێ بە ڕەوەز بە کوشتم بدەی؟

Cut

دیمەنی – ١٠٥٣ – ش/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەوەزو ئەردەڵان بە قاتەوە وەستاون، ئەردەڵان شڕو شێواوە ))

ڕەوەز: دوکانەکە بکە بەشیرینیی، نزیکی تریفەیت.. بەهۆی کامێراکەوە بە ئاسانیی ئەتوانی چاودێریی  هەموو ئەوان بکەی کە سەردانی ئەکەن.. لە ڕێی ڕۆتەرەکەوە ئاراستەی کامێراکە ئەگۆڕیت هەر چۆنێکت بوێت.

ئەردەڵان: ئاخر نایزانم.

ڕەوەز: بەیانی یەکێک ئەنێرم هەموو شتێکت فێر بکات.

ئەردەڵان: ئا زوو فێر ئەبم، جوان سەیری دەستی ئەکەم.

ڕەوەز: زۆر باشە.. بەڵام ئیشێکی کەمێک قورسمان هەیە ئەترسم پێت نەکرێ.. ئەگەر ئەوەمان بۆ بکەی لەمەودوا حسابی خۆت نازانیت.

ئەردەڵان: مادام وایە پێم بڵێ، هەرچییەک بێ من ئەیکەم.

ڕەوەز: ئەتوانی کەسێک بکوژیت؟ نا، باوەڕ ناکەم ئەوەندە بەدەست و شارەزا بیت.

# (( ئەڵقەی پەنجاو یەک))

ئەردەڵان: تۆ باشم ناناسی کاکە ڕەوەز، ئەوە بە ڕاستتە؟ بە شەرەفم بەس پێم بڵێ کێیە، یاڵڵای ئەکرد برای باوکم ئەبوو، بزانە چۆن ناوجەرگیت بۆ هەڵئەتەکێنم.

ڕەوەز: مەعلوم؟

ئەردەڵان: هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو.

ڕەوەز: ئەی ئەگەر ئەمە دنیایە، لەو کاتەیا پۆلیس لەو دەوروبەرە بوو و دواتکەوت؟

ئەردەڵان: کاکە ڕەوەز، هەموو سەرمایەو بنمایەی ژیانی من ئەم ئیشەیە.. چۆن لە خۆمی ئەکەم.. لە پێش ئەوەی دەست پێ بکەم باش باش ئەو ناوە ئەپشکنم، ئیتر خۆ کوێراییم دانەهاتووە، کە پۆلیس هەبوو ئەیخەمە کاتێکیتر.

ڕەوەز: ئەوەم زۆر بەدڵ بوو، پێشتر خۆت بپارێزە، لە چارەسەر کردن و ڕزگار بوونت زۆر باشترە ئافەرین.

ئەردەڵان: کەسەکە کێیە ناوەکەیم بدەرێ و هەقت نەبێ.

ڕەوەز: باوەڕ ناکەم تۆ بیناسی.. سەرۆک هەر ئەوەی وت کە ئیشمان پێی نەماوە.

ئەردەڵان: بۆ ئیشتان بە هەرکەس نەمێنێ ئەیکوژن؟

ڕەوەز (( دەست ئەکێشی بە شەنیا)): تۆ نا لەبەرئەوەی تۆ ئەیانکوژی.. هههە خەمت نەبێ، بۆ تۆ من لە پشتتم، باکت بە هیچ نەبێ، تۆ برای منیت.. ئەمجارە تەنها چاودێریت پێ ئەکەم.

Cut

دیمەنی – ١٠٥٤ – ش/ن – میسر:

(( دیمەنی ئاواو نینا لە میسرو هەندێ حواری سەربەستی ماندوێتیی و چوونە دەرەوە بۆ نانخواردن و ئاسایی))

Cut

دیمەنی – ١٠٥٥ – ڕ/ د – بەردەمی دوکانی شیرینییەک:

(( ئەکرێ دوکانەکە چۆڵ بێت و هەندێک مێزی شووشەی بۆ هاتبێ بۆ نمایش کردنی شیرینییەکە.. دوکانەکە نزیک بێت لە ئۆفیسی وەکالەتەوە، کامێرا چاودێرییەکەی زەق بێت ڕووەو ئۆفیسی وەکالەت.. لە هاوڕێی چایچییەوە نزیکە))

ئەردەڵان: ئا وەرە چایچی، تا ئێرە وەرە.

هاوڕێ (( دێتە نزیکی)): ئەوە بۆ وا بانگم ئەکەی ماخۆلان؟ نەڵێی گۆڕاوم.. ئەگینا حسابی (( ژێر پیاڵەکەی کەمێک چای تیایە، ئەیرێژێ))ئا ئەوەت بۆ ناکەم و دەم نادەی لە چای منەوە.. وەرەوە هۆشی خۆت، هەی بێهۆش. (( لەبەرخۆیەوە)) مل پان...

ئەردەڵان: ئەی بۆ خدر بۆ ئەکەویتە هەلەکە سەماو جێ بە خۆت ناگریت؟

هاوڕێ: ئەو پیاوە پیاو، قەت لە خۆی ناگۆڕێ، خۆ وەک تۆ ناکەس بەچە نییە.

ئەردەڵان: ئیتر حەماڵەکەی جاران نیم هاوڕێ، منیش هیچم کەمتر نییە لە خدر بابزانی.. هەرچییەکم داواکرد ئەیهێنیت و توشی دەنگەدەنگم مەکە.

هاوڕێ: دەی بەڵێن بێ تا نەبیتەوە بە ئەردەڵانەکەی جاران و پیاو نەبیت، یەک کلۆی دیلژەمەش چییە لە منی نابینی.. هەرچیت ئەوێ وەک پیاو دێیت بۆ چاخانەکە.. ئیتر حسابی خۆت بکە. (( هاوڕێ ئەڕوا))

ئەردەڵان: چش، ئەیهێنی نایهێنی هەردوو چاوت دەرێ.. هەتیو ئەو خدرە بێقیمەتە چەند بەختی هەیە؟ بە ژن و پیاوەوە ڕیایی بۆ ئەکەن.. بووم بە ئەفەنیش کەچی چایچییە نابووتەکەش حسابم بۆ ناکا.. دەی چاوی دەرئەهات، لەگەڵ خۆما تەرمۆزەیەک ئەهێنم و منەتی ئەو هەڵناگرم.

Cut

دیمەنی – ١٠٥٦ –ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن و خدر لە ژوورەوەن))

خدر: تا خوارەوە ئەچم بزانم چییان کردووە.

نارەوەن: ئێ باشە.

(( خدر ئەچێتە دەرەوەو دیدەوان بە ماتە مات قطعەیەکی مەتر بە مەتر بە ٥٠ سانیمی پێیە داپۆشراوەو دێتە لای نارەوەن))

دیدەوان: سڵاو لە گوڵ.

نارەوەن(( بزە)): سڵاو کاک دیدەوان بەخێر بێیتەوە.

دیدەوان: بە بۆنەی گەڕانەمەوە ئەم دیارییە بچووکەم بۆ هێناوی، لەبەر ئەو هەتیوە لە بەیانییەوە نەمئەویست بیهێنم.. ئێستاش تۆ پێی مەڵێ و هەر بەمشێوەیە بیبەوە بۆ ماڵەوەو لەوێ هەڵیواسە.

نارەوەن(( لێی وەرئەگرێ)): زۆر سوپاس دەستخۆش (( یەکسەر بەرگەکەی ئەدڕێ)) واو.

دیدەوان: ئەی نەموت لە ماڵەوە تەماشایکەو هەڵیواسە؟

نارەوەن: نا نا خۆ ئەبێ بزانم چییە؟.. باشیش لە قسەکەت تێنەگەیشتم ببورە.. ئادەی چی نوسراوە.. (( ئەیخوێنێتەوە، دێڕێک شیعری نالییەو نوسراوە نالی))

دەست بەندیانە، دێن و دەچن سەرو و نارەوەن

ساحیب کولاە و سایەو بەرگن وەکوو مولووک.

(( دوای خوێندنەوەی)) زۆر سوپاس دەستەکانت خۆش زۆر جوانە.. لێرە هەڵیئەواسم با هەموو کەسێ بیبینێ، لە پشتی سەرمەوە.. ئەوە من لەو دێڕە شیعرەی نالییەوە ناونراوم، زۆر سوپاس.

دیدەوان: شایانی نییە،بەڵام بەقوربانە، ئەوە هەر بۆ تۆیە، با کەسیتر نەیبینێ.

نارەوەن: من سوپاست ئەکەم، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ شتێکی شاراوەم نییە لە ژیانما، ئەمەش هەروایە، ئێستا بە هەردی ئەڵێم هەڵیواسێ. (( زەنگ لێ ئەدات و بەردەست دێت)) هەردی گیان ئەمەم لە پشتی سەرمەوە (( ئاماژە ئەکا)) ئا ئەلەوێوە بۆ هەڵواسە.

هەردی: بەسەرچاو نارەوەن خان.

نارەوەن: دە فەرموو دانیشە کاک دیدەوان.

دیدەوان(( ئیحراج)): ڕاستییەکەی بۆ دانیشتن هاتبووم ، تازە کاتی بەسەرچوو دێمەوە ئاساییە.

(( دیدەوان ئەچێتە دەرەوەو شوکری تابلۆکە هەڵئەواسێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٥٧ – ڕ/ن – قاوەخانەیەک:

(( تریفەو شەنیا دانیشتوون))

تریفە: زۆر باشت کردووە کە ئاگادارت کردۆتەوە لەوەی بۆ پارە کێشانەوە تۆیان ناردووە.. من زۆر باش لەوە ئەگەم چۆن پێت بە جەرگی خۆتا ناوە، کە لە پێناوی ئازیزێکتا ئەیکەی.

شەنیا: بەڵام حەیف، درەنگ بوو، ئەگەر زووتر من بمدرکانایە، ڕەنگە ئێستا ژن و مێرد بووینایە.. ئێستا ئەزانم ئەو بە فریودەرم تێئەگا.. مەگەر هەرخوا جارێکیتر بمنسازێنێتەوە.

تریفە: ئەی خوا خێرخواشی بۆ دروست ئەکا، وانییە؟

شەنیا: چۆن وا نییە دڵەکەم؟ من هەموو نیشانەی خێری ئەم دنیایە لە چاوی تۆیا ئەبینم، ئەی وا ئەزانی لەخۆڕا ڕووم لێناوی؟

تریفە: سوپاس، بەو هیوایەی وابێ و بتوانم دوو دڵی پاک و جوان ئاشتکەمەوە.

شەنیا (( هەڵئەسێ ماچی ئەکا)): قوربانی دەمت بم.

تریفە: بەڵام ئەبێ جارێ گوێ لەویش بگرم، ئەوسا بەو هیوایەی چارەسەری ئاسان بێت.

شەنیا: ئیتر ئەوە بزانە هەر تۆ شک ئەبەم تریفە گیان.

تریفە: ئینجا با بڕۆین، من ئەبێ بگەڕێمەوە بۆ ئۆفیس و ئێستا کاک هەندرێن وەسڵی دنیای بۆ داناوم.(( هەڵئەسێ))

شەنیا (( هەڵئەسێ)): ڕۆستنی چی؟ تۆ ئێوارە میوانی منیت.

تریفە: نەبەخوا ناگونجێ، بۆ جارێکیتر.

(( چوونە دەرەوەیان)) ——————— Cut ———————

دیمەنی – ١٠٥٨ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و ڕەوەز بە پێوەن))

ڕەمزی: ئەم شۆفێریی ئەزانیٚ؟

ڕەوەز: نا، سایەقیی چی؟ ئەو قەت ئەوەندەی نەبووە خۆی بە سەیارەوە خەریککا.

ڕەمزی: کەواتە با هەر لەگەڵ خۆیا سەرکەویٚ، خۆم بە تەلەفون پێی ئەڵێم بچێتە شوێنێکی چەپەکەوە، ئەمەویٚ بیبینم.. کاتەکەت بۆ دیاری ئەکەم و ئەوانی بۆ بنێرە لەکۆڵیکەنەوە.

ڕەوەز: بەسەرچاو خەمت نەبیٚ.

ڕەمزی: پارەیەکی باشیش بە بەو هەتیوە با چەشە بیٚ.. ئیشیترمان پێی ئەبیٚ.

ڕەوەز: سەرچاو.. با ئەمە وەک ترس شکاندنی بیٚ، هەرچەندە کون لە جەرگیا نییە، جارەکانیتریش بە خۆی ئەکەین و یەکێکیتر پارێزگاریی بکا.

Cut

دیمەنی – ١٠٥٩ – ش/ن – هۆڵی دانیشتنی ماڵی نیگار:

(( زوبێرو ئامۆو چیمەن بە منداڵەکەیەوەو بروسک و نیگارو دەوران هەن))

چیمەن(( بۆ نیگارو دەوران)): باوەڕ ناکەی چەندمان پێخۆش بوو هاتن، ئەی ئەزانی ئیتر من و ڕێژوان و کاردۆو دەوران ئەبینە خوشک و برا؟ ئەی خۆشەویستیش بە یەکتر بینین و نزیکایەتی زیاتر ئەبێ.

زوبێر: کچم قسە بۆ ئایندە مەکە، لە ئێستاو پێشتریشەوە هەر خوشک و بران. هههه

ئامۆ: کاکە ئێمەشی تیاین، من و بروسک بۆ جیا ئەکەنەوە.

دەوران: ئینجا ئێوەش هەر برای ئێمەن، بەخوا هیچ جیاوازیتان نییە.

بروسک: ئێستا کەس چارەسەری دۆزیوەتەوە تا تۆزێ زووتر دەسڕی سەرچۆپی ڕاوەشێنین؟

نیگار: ئەویش هەر لە خەمی دەسڕەکەی خۆیەتی هههه.

زوبێر: ڕاستیەکەی کێشەکە هەر کاکی سەرچۆپی کێشە.. حەزی بەم گەڕەکە نییە، یادەورەیی ناخۆشی تیا هەیە.. کچم چیمەن ڕەنگە کۆنە یاری لەمناوە بووبێت. هههه

بروسک: نەوەڵا کۆنە یارم لەوسەری شار بوو، بۆیە حەزم لێرە نییە، ئەگەرئەچنە ئەوسەری شار ، سبەی ئەگوێزینەوە.

(( خەندەی هەمووان))

چیمەن: ئەوە نیت خۆت با مەدە، لەناو جەماعەتا.

(( پێکەنینی هەموو))

بروسک: کاکە ماوەیەکی کەم لێم بوەستن، با هەموو پێکەوە بێین، هەنێ وردە ئیشم ماوەو بەخوا خانووەکەش تاڵانفرۆش ناکەم، جارێ نەچۆتە ئەوەی دڵم ئەیەوێ.

نیگار: ئێمەش پەلەمان نییە، دوو هەفتەیتریش بۆ تۆ.

بروسک: ئەمە پەلەی نییە ئاغاژن؟ هههه.

(( پێکەنین ))

زوبێر: ئەی ئەگەر بیوتایە دوو ڕۆژ چی؟

بروسک: ئیتر فەرمانی قەرەقوشەو گەڕانەوەی نییە، ئەبێ بە قسەی بکرێ.

(( پێکەنین ))

نیگار: یاخوا قەرەقوش من بم.. (( ئاماژەی دەوران ئەکا )) ئێوە قەرەقوشتان نەبینیووە.

(( پێکەنین ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٠ – ڕ/د – باخێک:

(( دڵنیاو سەرچڵ پێکەوەن))

سەرچڵ: من پێمخۆشە بچیتە سەرکارێک و ئەو دۆزەخەی ناخت ونکەیت.. تۆ ئەزانی مایەی چ عەزابێکی گەورەی، هەم بۆ خۆت و هەم بۆ دەوروبەریشت؟

دڵنیا: ئەوەی زانیوتە هەڵەیەکی گەورەی ژیانمە، کە پەنگ خواردنەوە پێی کردم.. تۆ ئەزانی چەند زەحمەتە کچێک بە هەموو هیوایەکەوە بڕوانێتە ژیان و لە پڕێکدا وەک لە پردێک فڕێبدرێتە خوارەوە، یان بدرێ بەدەم گێژەنێکەوەو هیچ تێنەگا تا بینینی تاریکایی؟

سەرچڵ: من باش تێئەگەم، بەڵێ، بەڵام ......

دڵنیا (( قسەی پێ ئەبڕێ)): نا تۆ نە باش تێئەگەیت و نە ئەشزانی ژنێک یان کچێک بەوە چی بەسەردێت.. کوڕان وەک ئەوەی میوە بە توێکڵەکەیا بناسنەوە، وان.. لە کوێیا دەستیان برد بۆ میوەیەکی گەش و ناوەکەی تفت و تاڵ بوو، پڕ ئەدەنە دانەیەکیترو بەدوای شیرینیدا ئەگەڕێن.

سەرچڵ: کوڕان و کچانیش هەر بەدوای شیرینییدا وێڵن. جیاواز نیین.

دڵنیا: نا ئیتر سروشتی ئێوە ئەوەی سەپاندووە.

سەرچڵ: سروشتی ئێمەش ئەوەی سەپاندووە، بە ترسەوە دەست بدەینە میوەکە، گەر توێکڵی جوان بێ یا ناشرین.. نامانەوێ ببین بە تێستکەری میوە.. بۆ جاری دووەم، ئەگەر زۆر پێویست نەبێ خۆمان نادەینەوە لە تاڵیی و تفتیی.. کە خۆشمان لێدا ئەبێ بەرگەی هەندێ لە ئازارەکانی بگرین، یان بە یەکجاریی پاشەکشە بکەین و خۆ لە میوە نەدەینەوە.

سەرچڵ: ئەمە تەواو ڕەشبینییەو بەم بیرکردنەوەیەوە کەوتوویتە سەر ئەو هەڵەیەی خولیا بدەی بە کەسانیترو دواتر تاڵاویان دەرخوارد بدەی.

دڵنیا: ببورە سەرچڵ گیان، بیرکردنەوە نەبوو، تۆڵەیەکی ساویلکانە بوو.. من پەیمانت ئەدەمێ، نەک لەگەڵ تۆدا بم.. بە هیچ جۆرێک ئەوە دووبارە نەکەمەوە.. ئەبووایە من تۆڵەم لە خودی کەسەکە بکردایەتەوە.

سەرچڵ: نا ئێستاش لەگەڵتا نیم، نابێ بیر لە تۆڵە بکەیتەوە.. ئەبێ لە بیری خۆتی ببەیتەوە، من نامەوێ ژنی من بە ڕقیشەوە بیر لە هیچ کەسێکیتر بکاتەوە.. ئەگەر ئەتوانی وابیت، مانای وایە من توانیم کارێک بکەمە سەر تۆ.. ئەتوام باز بەسەر هەڵەکانیشتا بدەم و وەک ئەوەی تۆ ئەهلی هەڵە نەبووبیت.

دڵنیا: سوپاس.. تۆ گەورەیت.. منیش هەوڵی تەواو ئەدەم،وەک تۆ بکەم.

(( پیاسەی باخەکە))

Cut

دیمەنی – ١٠٦١ – ڕ/ د – بەردەمی چایخانەکە:

(( هەندرێن چاو لەفە ئەخوات و هەرمێ جلوبەرگی ئاسایی و لەچکی بەسەرەوەیە دێت.. بۆنی لادێنشینیی پێوەیە.. هاوڕێ لەوێیەو پرسیاری لێ ئەکا ))

هەرمێ: زەحمەت نەبێ؟!

هاوڕێ: بەڵێ خوشکم. (( هەندرێن دیقەتی ئەدا ))

هەرمێ: کۆمپانیای کاک حەمە خدر کامەیە؟

هاوڕێ: وەڵا ئێستا نازانم کەوتۆتە کوێوە، بەڵام بچۆ لەو ئۆفیسە بپرسە، کچێکی لێیە ئەو ئەیزانێ لە کوێیە.

هەندرێن: باوەڕ ناکەم ئەویش بیزانێ.

هەرمێ: ئەی چۆن دەستم بکەوێ؟

هەندرێن: بچۆ بۆ لای کچەکە بزانە چیت پێ ئەڵێ.

هەرمێ: ژمارەیتان لانییە؟

هەندرێن: بچۆ بۆ ئۆفیسەکە (( خەریکی لەفەکەی ئەبێت.. کچەکە ئەڕوات ))

هاوڕێ: بەشەرەف ئەوە ئێستا ئەردەڵان لێرە بووایە، هەزارو یەک بوختانی بۆ هەڵبەستبوو.

هەندرێن: تۆ باسی بەشەر بکە، بۆ ناوی گوێرەکە ئەهێنیت.

Cut

دیمەنی – ١٠٦٢ – ڕ/د – ساحەی نەخۆشخانەی زوبێر:

(( زوبێرو نارەوەن پیاسە ئەکەن))

نارەوەن: نا هیچ شتێکی ئەوتۆ نییە نیگەرانیی دروست بکا، بەڵام هەر کەسێک لێت هاتە پێشەوەو داوای دابینکردنی پێداویستیی پزیشکیی لێکردی، پێی بڵێ نارەوەنیش بۆ ئەوە هاتەلام، بڵێ بەقەدەر خوشکێکم ئازیزە لام، بەڵام من ئەو کارانەم مەیسەر کردووەو ئیشێکم نەماوەتەوە ئامادەسازییم بۆ نەکردبێ.

زوبێر: تۆ لە مەترسیا نیت؟

نارەوەن: بەهیچ جۆرێک.

زوبێر: کەوابێ، وا تێئەگەم کەسێک بیەوێت لەڕێی ئەو ئیشەوە نێوانمان بشێوێنێ.

نارەوەن: جا بۆ ئەوەی هەر برا گەورەکەم بیت، ئەوە بڵێ کە وتم.

زوبێر: زۆر سوپاس بۆ ئاگادارکردنەوەکەت نارەوەن خان.. تازە هیچ هێزێکیش ناتوانێ نێوانمان تێک بدا، ئێمە یەکماڵین.

نارەوەن: تکایە با ئامۆش نەزانێ بۆ ئەوە هاتبووم.. خۆت شتێک بڵێ.

زوبێر: نا ئامۆ زۆر تاقەتی خۆتێهەڵقورتاندنی نییە، ڕەنگە هەر پرسیاریش نەکا.

(( بەدەم ڕێوە لە میوتیدا دایالۆگ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٣ – ڕ/ن - کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەووەز بە دڵەڕاوکێوە دەستی ئەدا بە یەکاو چاوەڕوانی ئەردەڵانەو پەیا ئەبێت))

ڕەوەز(( تورِە)): ئەرێ ئەوە تۆ لە کوێی؟ گەمژە؟!

ئەردەڵان: بەخوا خەتای من نەبوو خۆی دواکەوت.

ڕەوەز(( دەمانچەیەک دەرئەهێنێ و ئەیداتێ)): بیگرە، وەک فێرم کردی وا ئەیتەقێنی و دواییش لەو جێگەیە بۆم دائەنێی کە پێم وتووی، با چەکتان پێ نەبێ لەوسەرەوە.. ئەمە هەر بۆ خۆپاراستنە، تەقە ناکەی تا ئەو پێت ئەڵێ، گوێت لێ بوو؟

ئەردەڵان: هیچ خەمت نەبێ کاکە، ئەگەر ئەیناسی ئێوارە بچۆ بۆ تەعزێکەی تێرو پڕیش بخۆ.. خۆم ئەو ئەپارێزم.. ناهێڵم کەس بێ بەلایا.

ڕەوەز: سەعات سێی ڕێک ئەو لەوێیەو ئەگەنە سەری.

ئەردەڵان: کەواتە دەرەنگە با ئێمە بڕۆین.

ڕەوەز: تۆ بێ هەڵەو بێ شڵەژان.. ئەو خۆی شارەزایە، ئیشی خۆی ئەکا.. ئاگاداربە ئەمجارەش پێت ئەڵێمەوە، ئەو ئەیکوژێ نەک تۆ.. تۆ تەنها پاسەوانیی و چاودێریی ئەکەی.

ئەردەڵان: هیچ خەمت نەبێ، خواحافیز.

(( ڕەووەز تەماشای سەعات ئەکات، بیستی ئەوێ بۆ سێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٤ –ڕ/ن - کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن و حەمە خدر خۆیان کۆئەکەنەوە بڕۆنەوە))

نارەوەن: ئیش زۆرە.. زوبێر ڕازیی نابێ چییە؟ دەی وەک ئەو هەیە، هەر گوێشی مەدەرێ.

خدر: نەوەڵا لەبەر ئیشم نییە، بەڵام ئەوە ڕاسپاردەی کاک ڕەمزی بوو، هەڵبەت شارەزای ئیشەکەیەو ئەزانێ خێرێکی باشی تیایە.

نارەوەن: با بڕۆین، کەس نازانێ خێر بەچیەوەیە.

خدر: هههە دیسان داتەوە دەست قەدەرە ڕوحەکە.

نارەوەن: بەخوا من هەر ئەوەی لێ تێگەیشتووم.

(( لە چونە دەرەوەدا دیدەوان دێتە ژوورەوە))

دیدەوان: باشن؟ ئەوە ئێستا شوشەکان گەیشتن.

خدر: تازە بەم درەنگانە چی لێ بکەین؟ خۆت ئەتوانی بمێنیتەوە؟

دیدەوان: تا ئەوەندەی تاقەتم بێ.

نارەوەن: ئەوە بە تاقەت ناکرێ کاک دیدەوان، یا هەمووی داگرن، یان هیچی دامەگرن و بیخەنە بەیانی.. خۆ ناکرێ نیوەناچڵ جێیبهێڵی؟

دیدەوان: فەرمایشتی جەنابتە، تۆ ئەمرەکەی سەرچاو.. ئەمێنمەوە.

نارەوەن: باشە ئافەرین.. (( بۆ خدر)) دەی وا ئەمێنێتەوەو سەعات سێیە با بڕۆین.

(( خواحافیزیی و ئەچنە دەرەوە.. دیدەوان لە پشتەوە حەسرەت ئەکێشێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٥ – ڕ/ د – شوێنێکی چەپەک:

(( ڕاماڵ لە پەنا دیواری ماڵێکدا وەستاوەو تەماشای سەعات ئەکا.. دەنگی سەیارەیەک دێت و ڕاماڵ بە ڕووی گەشەوە بەرەو ڕووی ئەچێت.. کەمێک نزیک ئەبێتەوەو ئەتاسێ))

ڕاماڵ: ئای بەخوا باش بوو هاتی، ئەی ئەو برادەرە کێیە لەگەڵتا؟ تۆ!!!!!!!!! ئەوە چی ئەکەی؟ ئەو دەمانچەیە چییە بەدەستتەوە؟ تۆ بەهەڵە هاتووی، من ڕاماڵم ڕا..........

(( فیشەکێک بەر ناوچەوانی ئەکەوێت و ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٦ – ش/ د – خێمە:

(( دایالۆگ سەربەستە))

أ - (( تەعزێی ڕامالّە، تیرۆژو نارەوەن و گێلاس و دەوران و تریفەو شەنیا ئەبینرێن لە ناو چەند ژنێکیتردا، متەوازع و هەژار، ئەگەر هەندێ سیمای لادێنشینیش بە ژنەکانەوە هەبێت.. هەردی مەلایەکی ژن بە میکرۆفۆنەوە ئەهێنێت و کورسیی و تەپڵەکی بۆ ئامادە ئەکات و ئەڕوا))

تریفە: کوڕەکە زۆر وەزعی باش بوو، بەڵام ماڵی باوکی فەقیرحاڵ دیارن.

شەنیا: وابزانم پارەی خۆی نەبوو ئیشی پێوە ئەکرد.. ئەم هەر کارمەند بوو ئیشەکەی بەڕێوە ئەبرد.

تریفە: ئێ ئێ، دیارە.

---

ب – (( لە خێمەی پیاوانیشدا، زوبێرو بروسک و ڕێژوان و خدرو ئامۆو هەندرێن و هاوڕێ و ئاکۆو دیدەوان و سەرچڵ و زاهیدو ڕەوەزو ڕەمزیش کاتێکی کەم دێت ئەبینرێن، لە ناو چەند پیاوێکی هەژارو متەوازع دا، سیمای لادێ نشینیی هەبێت باشترە.. لێرەشدا دایالۆگ و فاتیحاو ئسولّی تەعزێ سەربەستە، ئەوەندەی پەیوەندیی بە مەراسیمەکەوە هەبێ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٧ – ش/ن - ژووری بەهێز:

(( بەهێز بە پەلە ئەگەڕێتەوەو ئاری بەدوایدا ))

بەهێز: جێی فیشەکەکە دیارە لە دوورەوە تەقەی لێکراوە، با سبەی ڕاپۆرتی پزیشکی دادوەریش بێتەوە، زیاتر ڕوون ئەبێتەوە.

ئاری: گەورەم ئەسەری هیچ جۆرە لێدان و ئەشکەنجەیەکیشی پێوە نییە، گەر لێی نزیک بووبێتنەوە تەنها بۆ بردنی مۆبایلەکەی بووە.

بەهێز: سبەی بە فەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە نوسراو ئەکەین بۆ هێڵەکان و دەرئەکەوێ دوا پەیوەندیی کێ پێوەی کردووە.. دڵنیا بوویتەوە لەو دەوروبەرە هیچ کامێرایەکی چاودێریی ماڵ و دوکانیشی لێ نییە؟

ئاری: گەورەم پێ ئەچێ بەوردیی کارەکەیان کردبێ، هیچی لێ نەبوو.

بەهێز: دۆسیەکەیم بۆ بێنن، بزانین کوژراوەکە کێیەو پێشینەیشی ئەگەر هەبێت.

ئاری: سەرچاو گەورەم.

(( چوونە دەرەوەی ئاری بە تحیەو بەهێز تەماشا تخطیطی مسرح جریمە ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٠٦٨ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( هەرمێ و خدر دانیشتوون))

خدر: بێ چاوێنیی بیت هەرمێلە گیان چەند گەورە بوویت؟!

هەرمێ: جا تۆ ئەزانی لە کەیەوە نەتدیوم.. بەخوا خەریک بوو باڵم بۆ ئەگرتی.. تۆش زۆر گۆڕاوی کاکە پۆڵا گیان.. ئەمجارەیان وا نزیکەی شەش حەوت مانگە کورە چی نزیکی ساڵێکە نەمبینیویت هههه ماشەڵڵا ئێستا لەکوێ و ئەوسا لە کوێ، هەیهووووووو!

خدر: تۆ پێم بڵێ چۆن شوێن و ڕێگەت دۆزیمەوە؟ پێم نەوتی قەت نەیەی بۆ ئێرە؟

هەرمێ: چوومە ماڵی مامە سەلاح خواعافویکا، وتم ئیستەرەم یان خۆم ئەکوژم، یان ئەبێ شوێنی کاکە پۆلام پێ بڵێن.. یەک دوویەکیان هەر نەیانئەزانی پۆڵا کێیە. هههە

خدر: ئاخر مامە سەلاح لە تەسکەرەش ناوەکەی گۆڕیم.

هەرمێ: دەک قەت گەردنی ئازا نەبێ، وەک تۆی لە ئێمە کرد.. دایکم بەسوێی تۆوە سەری نایەوە، هەر ئەیوت دەوەرە کوڕێکت لە ژیانا بێ و لێی مەحروم بی، ساڵی جارێک، یەک ڕۆژ لات بێ.

خدر: ئەی کە بیستم نەساغە، خۆ ئەو ماوەیە هەر بەدیارییەوە بووم.

هەرمێ: ئەی ئەگەر هەر لە منالییەوە لەبەرچاوی بوویتایە، چەند خۆشتر ئەبوو.؟

خدر: ئیتر ژیانە هەرمێلە گیان، هەریەکەمان بۆ ئامانجێک ئەژی.

هەرمێ: بەس بەخوا کۆبوونەوەی خێزانیش زۆر خۆشە کاکە پۆڵا، خۆزگە هەر پێکەوە بووینایە.

______ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut ______________

دیمەنی – ١٠٦٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە- ژووری دیدەوان:

(( دیدەوان بە ئەنصات گوێ ئەگرێ و دەنگەکە وەک دەنگی مۆبایل دەرئەچێ))

خدر: هەرمێلە گیان.......

هەرمێ: توخوا چەند خۆشە هەر پێم ئەڵێی هەرمێلە هەر وەک جارانی و ناڵێی هەرمێ، بەس تۆ پێم ئەڵێی هەرمێلە.

خدر: ئا بەساقەوبم.. مامە سەلاح خۆی پیاوێکی زۆر باش بوو، خەڵکی زۆر خۆشئەویست.. من و دیلمانی کوڕیشی بۆ کارکردن پەروەردەکرد.. بەداخەوە دیلمان زوو بە هەڵە کوژرا.. ئیتر مامە سەلاح زۆر گرنگیی بە من ئەدا، ئەیوت هەرچیت کردووە نەکەی پارە کەڵەکە بکەی.. فەقیرو فوقەرا تێرکە.. چاوچنۆک مەبە.. هەرچی هەرچییەکت دەست ئەکەوێ، بە دادپەروەریی بیبەخشە بە هەژاران.

هەرمێ: جا خۆ بەخوا کەس کەس نازانێ ئێمەش بەچی ئەژیین ، ماڵی خۆمان نەبێ.. ئێمەش بەوە ئەژیین کە خۆت بۆمان ئەنێری و خێرو خێراتیشی هەر لێ ئەکەین.

Cut

دیمەنی – ١٠٧٠ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٦٨ – کۆمپانیای تازە:

(( خدرو هەرمێ))

خدر: تۆ ئەمڕۆ بڕۆوە بۆ ماڵەوە، لێرە مەمێنەرەوەو جارێکیتریش نامەوێ بێیتەوە بۆ لام.. بەڵێن بێ خۆم زوو زوو سەرتان لێ ئەدەم، هەر هیچ نەبێ لەبەر خاتری تۆو باوکم.. (( خەندە)) ئەرێ قسە بکە چەتیو! هیچت بنیاد نەناوە؟ دەستی کەست نەبڕیوە؟ هههە.

هەرمێ(( شەرمی زۆر)): بۆ ئەوە هاتووم، بە باوەشم وت ڕای کاکە پۆلای تیا نەبێ قەت شوو ناکەم.. ئیتر وتی دەبچۆ بیدۆزەرەوە.

خدر: بەساقەوبم، کاکە پۆلات لە خزمەتتایە، بەلام من ئیتر حەمەخدرم کاکە پۆلا نیم.

هەرمێ: بەلێ باشە کاکە حەمە خدر گیان.

خدر: دەبا بڕۆین، تا ئەشتگەیەنمەوە سەیارەی دێ، لە ڕێگە قسە ئەکەین.

هەرمێ: بەلێ باشە.

خدر(( هەڵئەسن)): تا ئەشگەینە ئەوێ بیرئەکەمەوە بزانم کەی ئەتوانم بگەڕێمەوە.. جارێ بۆ کاتی سەردانەوەم زۆرم ماوە.. بەلام بۆ ئەو مەسەلەیە هەر ئەبێ بگەڕێمەوە.

هەرمێ: قوربانت بم فەرموو.

(( ئەچنە دەرەوە))

______________ Cut ______________

دیمەنی – ١٠٧١ – ڕ/ن –ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ غەمبارو تریفە.. نارەوەن پەنیرو نان ئەهێنێت و بەدەمییەوە قسە ئەکات و چا تێ ئەکات و پاروو ئەکا ))

تریفە: ئەرێ وتم دانیشە من بۆت ئەهێنم!

نارەوەن: (( گاڵتە)) ئەی خۆم چیمە؟ ئێستاش لە ئێوە بەگوڕترم.. بەساقەوبم گاڵتەم کرد، هەر حەز ئەکەم خۆم بیهێنم. (( بە پەرۆشەوە)) بەڵام کچینە من هیچ هیچ لەم ماڵە تێنەگەیشتم، ئەمشەو خەریک بوو ئەو مێشکەم ئەتەقی.

تریفە: دیار بوو شەنیا باشی ئەناسین، وتی پارەی خۆی نەبووە، هەر کارمەندی سەرپەرشتی کردنی کارگەکە بوو.

نارەوەن: ئاخر سەرم لەوە سوڕ ئەمێنێ کچم.. خۆ خوانەخواستە دەستیشی نەکردووە بە ماڵی خەڵکاو ئەو هەموو پارە بێ شومارەی بۆ تیرۆژ خەرج کردبێ.

تیرۆژ: نا دز نەبوو.. ئەیوت من پارەی خۆم هەرگیز بە بە هیچ کەسێک ناڵێم تەنانەت بە ماڵی باوکیشم، بۆ ئەوەی کە ژنم هێنا خۆم باش بژیم.. ئیتر شەنیا کێیە؟ هەرچی وتووە درۆ ئەکا.

نارەوەن: ڕۆڵە ئەوە ناچێتە ئەقڵەوە، وەزعەکەی ئەو ماڵە لەوە شڕتر بوو کوڕ پارەیان لێ بشارێتەوە.. باوکم گەر کەسێک دراوسێیەکی واشیان هەبێ هەر ئاوڕێکیان لێ ئەداتەوە، چ جای دایک و باوک.. بەدەست خۆم نییە ئەو قسانە بە ئەقڵما ناچێ.

تریفە: بۆ داواکردنەکەش وتی دایکم لە سەفەرەو هەر ئەم خوشکەم هەیە کە هاتووەو لێرەش نازی.. کەچی وا نەبوو.

نارەوەن: ئا ئا منیش لەوێ دیقەتمدایێ دوو خوشکی داماوی هەبوو، هەر زۆر بێ بەرگ و گوناح بوون، دایکیشی زۆر داماو بوو، ئای خوایە چەند ئەو ژنانەم خۆش ئەوێ، هەر ئەتوت فریشتەیە.

تریفە: ئەو خوشکەشی کە هێنابووی لەوێ نەبوو.

تیرۆژ: ئەی خۆی وتی لە هەندەرانەو لێرە ناژی.

نارەوەن: تۆ بڵێی ئەو خوشکەشی هیچ هاوکاریی ماڵی باوکی نەکردبێ؟

تیرۆژ: گرنگ ئەوەبوو وتی هەر ئەمجارە ماڵی باوکم ئەبینن، من حەزم بە تێکەڵاویی ماڵی باوکم و ماڵە خەزوران نییە.

نارەوەن: ئەوەشی وتووە؟ بۆ ئێمە دوژمنایەتیمان ئەکرد، یان کچمان داونەتێ؟

تیرۆژ(( عصبي)): نەما، نە، ئەوەش نەما.. ئەرێ لە گۆڕەکەشا وازی لێ ناهێنن؟

نارەوەن: کچم من خەمی تۆمە، ئەڵێم نەک لەسەر ئەو پارەیە کوژرابێ و ڕۆژێک لە ڕۆژان بێنەوە سەرت.

تیرۆژ: من تازە ئەوە پارەی خۆمەو موڵکە بە ناوی منەوە، هیچ هێزێک نییە بتوانێ لێم وەرگرێتەوە.

تریفە: زۆر دڵنیابە کەسیش لە ماڵی خۆی خۆش نابێ لەبەر چاوی بازی تۆ.. خوا بکا توشی بەڵایەکیشت نەکەن.

تیرۆژ(( هەڵئەسێتە سەرپێ)): یەعنی ئێستا ئێوە بە دوو حاکم بڕیارتاندا ئەو داماوە دز بوو، باش نەبوو هیچتان بەدەست نەبوو (( ئەڕواتە ژوورێکیتر)) تاحححححح!

نارەوەن: ئەو مێشکی بەتاڵە کچم، هەر چاوی لە پارەکەیە، تۆ لەسەر ئیشەکەت وریابەو چاوێکت بکە بەسەد چاو.. پێموتی ئەوەندەش لە شەنیا نزیک مەبەرەوە، شتی لەژێر سەرایە، هەموو شتێ دانێن بۆ خۆم، نهێنی ئەمە هەر ئەدۆزمەوە.. خۆ کچەکە ناکەم بە قوربانی پارەی گڵاو.

تریفە: من خۆمی تێهەڵناقورتێنم دایکە، بەڕاستی سەرم لێی دەرناچێ.. مەگەر تۆو حەمە خدر دایمە شت قووڵ ئەکەنەوە، دوایکەون و شتێک بدۆزنەوە.

نارەوەن: جا باش ئەکەین یا خراپ؟

Cut

دیمەنی – ١٠٧٢ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی پێکەوەن.. حسابات ئەکەن))

ڕەمزی(( لەژێر لێوەوە)): ئا بیرم کەوتەوە خۆشتان خۆش بن.

شەنیا: تەنها هاوڕێم بوو، هیچم نەبوو وەک خزمایەتی. بەڵام کەسێکی خراپ نەبوو.

ڕەمزی: هاوڕێ و ئەهـ (( خەندە))

شەنیا(( غەرابەت)): هاوڕێ و چی کاک ڕەمزی؟ تێناگەم.

ڕەمزی: با باش تێئەگەی، بەڵام خۆت نەبان ئەکەی.

شەنیا: ئاخر لە چی خۆم نەبان بکەم؟

ڕەمزی: عاشقێکی سەرسەختی تۆش بوو، کەچی لە پڕێکا لێت هەڵگەڕایەوەو یەکێکیتری هێنا.

شەنیا: من ئەوم وەک عەشق نەئەویست، تەنها وەکو هاوڕێ.

ڕەمزی: خۆتۆ مناڵ نیت شەنیا.. بیرت لەوە نەکردەوە، چۆن کەسێک بەو ئەندازەیە خۆشی ویستبی و ژیانی خۆی بەوجۆرە بەتۆوە بەستبیتەوە، لە پڕێکا بەهەمان شێوە ژیانی پێشکەش بە کچێکیتر کردو یەکسەر داوای کرد.. کچم ئەقڵ بۆ مرۆڤ باشە.

شەنیا: بەڵام من پێمخۆش بوو ئەوە ڕوویدا، چونکە بە دۆزینەوەی تیرۆژ، بە یەکجاریی لەکۆڵ من بووەوە.. تەنانەت کە پارەکەشم بۆ برد، هیچ بایەخی نەبوو.

ڕەمزی: ئیتر بە دڵگۆڕینێکی ئاسایی وەرتگرت و گوێت نەدایە؟!

شەنیا: ڕێک وابوو، هیچ بایەخم بەوە نەدا.

ڕەمزی: ئەوی لەگەڵ ئێمە ئیش ئەکا شەنیا گیان، ئەبێ زۆر وردو تێبینیی خێرای هەبێت، نەک تەنها ئەو خاڵە ببینێ کە ئامانجیەتی، ئەگینا پێستی ئەگرون.. تۆ بزانە دەزگای هەواڵگری و پۆلیس و ئاسایش و نەهێشتنی تاوان و هەموو ئەوانیتریش،

لەوە بەئاگاترن، ئێمە بە ئیسراحەت ئیشی خۆمان بکەین، جاری ئەوتۆ هەیە لە حاڵەتێک ئاگاداریشن و چاوی لێ ئەنوقێنن، بۆ دەرخستنی ئامانجی گەورەتر.

شەنیا: جا عاشقبوونی داماوێکی وا پەیوەندیی بە پۆلیس و ئاسایشەوە چییە؟

ڕەمزی: پەیوەندییەکەی ئەوەیە کە هەر شتێک بەرنامەدار بوو، گەر پێیان زانی، ئەوان دوای پشتی ئەوە ئەکەون تا بزانن لە پشتەوە چی ئەگوزەرێ.

شەنیا: من تێناگەم، ئاسایش و پۆلیس بۆچی بەرنامە بۆ لاتوپوتێکی ئاوا دائەنێن؟ چ جۆرە بەرنامەیەک؟ قسەکانت زۆر ئاڵۆزن.

ڕەمزی: کەرە ئەوان بەرنامە بۆ کەس دانانێن، ئەوە بەرنامەی ئێمە بوو، بەو ڕاددەیە خۆی وا نیشان بدات کە شێت و شەیداو هارت بووە.

شەنیا(( دیقەتدان بە وردیی)): واو چەند زۆرزانن، بەڕاستی نمایشێکی جوانی بۆ ئەکردم، دنیاشی لێ ڕاسپاردم.

______ گەڕانەوەی هەیە ________________ Cut ______________________

دیمەنی – ١٠٧٣ – ڕ/ن – بەردەرکی ماڵی نارەوەن:

(( حەمە خدر بەسەیارەکەیەوە ئەچێ بەدوای تریفەو نارەوەندا ))

تریفە: کاک حمە خدر ڕێی ئێوە جیاوازە بەقوربان، من سەیارەکەی خۆم دەرئەکەم.

خدر: باشە، جارێ بەیانیت باش و ئەوسا پێشمکەوە با تا ئۆفیس ئاگام لێت بی.

تریفە: هەر شەرمەزارت کردم، ببورە بەیانیت باش.. باشە من دەرئەچم.

(( نارەوەن دێتە سەیارەکەوە ))

نارەوەن: زۆر دواکەوتی.

خدر: ئیشم هەبوو.وەن: جارێ لە. کە بۆ بازاڕ ئەچی پەلەت چییە؟ ئەی ناچیتەوە کۆمپانیا؟

نارەوەن: جارێ لەبەر ڕاماڵ نا.

Cut

دیمەنی – ١٠٧٤ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٧٢ - ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

ڕەمزی: ئەویش هەر بەرنامە بوو.

شەنیا: جا منی داماو ئاگریش بم کوێ ئەسوتێنم؟ تا بەرنامەم لەسەر دابنرێ و بکرێمە نیشانە؟

ڕەمزی: ئەو سەروەختە سەروەختی میرنیزامی باوکت بوو.. کە وەسفی تۆی بۆ کردین و تۆمان نارده لای ئامۆ.. ئەبووایە خاڵی لاوازو بەهێزت بزانین.. بە هۆی ئەوەوە پارەو گرنگیی پێدانی زۆرت بەرکەوت.. بەڵام تۆ خۆڕاگرتر بووی لەسەر کارەکەت.. هەرچەند خۆشەویستیت بۆ ئامۆ وایکرد داوای پارە لە ڕاماڵ بکەی، بەڵام بوو بە خاڵی بەهێزی تۆ.

شەنیا: چ جۆرە خاڵێک؟ بۆچی بەهێزیی بوو؟ ئەبووایە بڵێی لاواز.

ڕەمزی: تۆی ئامادەکرد بۆ ئەم کارەی ئێستا، کە ئامۆ بەهیچ کاریگەرییەک ناگۆڕیتەوە.. کەواتە ئەم ئیشە تەنها بە خۆت ئەکرێ.

شەنیا: ئەی ئەگەر ئەو نەیویستم؟

ڕەمزی: بەخۆشیی خۆی نییە، مەگەر هەر دڵی نەبێ، ئەگینا گەر ژن بێنێ، بۆی نییە لە تۆ زیاتر دەست بخاتە سەر هیچ کەسێکیتر.

شەنیا: خۆ لەو کاتەیا وەکو ڕاماڵ نایکوژن؟

ڕەمزی (( تورە)): کێ پێیوتووی ئێمە کوشتمان؟

شەنیا: من کەس نابینم تا پێم بڵێ.. لەناو قسەکانی خۆتا بە شاراوەیی خۆت دانت پیانا.

ڕەمزی: چۆن؟

شەنیا: کارت بەو قوڕبەسەرە کرد منت بۆ تێست بکاو سەریگرت.. دواتر ئەو ئیشەت پێی نەماو ناردت بۆ کچەکەی کاک دارەوان و ئەویش سەریگرت.. ڕۆژێکیش پێت وتم

ئەو ئەمانەتەی کاک دارەوان بۆ کچەکەی داناوە ئەیدەینێ.. ئێ، کەواتە بە ڕامالا بۆت ناردو ئیتر ڕامالّ بێ ئیش بوو.. نەتئەویست ببێتە مێردی، بەڵکو تەنها ئەمانەتەکەی بداتێ ئەوە ئیشی ئەو بوو.. ئێستاش ئیتر ئیشی لای تۆ نەماو بۆ ئەوەی هیچیش ئاشکرا نەکا، وتت با بحەسێتەوە.

ڕەمزی: دەی دەی وردە وردە خۆت دەرخە.. زۆر بە گێژم ئەزانیت، بەڵام هەروەک ئیشی ئێرە ئەویش باش شارەزا بوویت.

شەنیا: ئەی چۆن؟ من کەم نیم.

(( نیگار دەست و پلی شتووەو تەڕیی پێوە دیارەو دێتە ژوورەوە))

نیگار: ئەوە هیچ ئەزانم تۆ کەم نیت، بەڵام چی تازەت کردووە وا شانازیی ئەکەیتەوە؟

شەنیا: وردەکارییەکی زۆر ئاڵۆزم بۆ شی کردەوەو تێمگەیاند.

ڕەمزی: شەنیا حەلی نەماوە.

نیگار: ئادەی بزانم چییە؟

شەنیا: دنیایەک ژمارەو دەرکردن و کۆکردنەوەیە، جارێ نەبووە بە پارە، هەرکاتێ بوو، خۆم ئاگادارت ئەکەمەوە.

نیگار: نەبەساقەوبم، ئەو شتانە بۆ خۆتان.

ڕەمزی: یەعنی هەر پارەکەت مەبەستە هاهاها.

Cut

دیمەنی – ١٠٧٥ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ قاپ و پیاڵە ئەشوات و ئەردەڵان دێت))

ئەردەڵان: هاوڕێ هەموو مانگێک سەد دۆلارت ئەدەمێ بۆ خۆت و پارەی هەموو ئەو چایانەشت ئەدەمێ بۆم ئەهێنیت، خۆت بیهێنەو خەتی لێبدە، بڵێ ئەوەنە ئەکاو بتدەمێ.

هاوڕێ: ئەردەڵان گوێ بگرە، هەموو ئەو پارە کۆکراوەی حەماڵییەکەشتم بدەیتێ کە لای ئێمە ئەتووت ناتوانم دوو دینار کۆبکەمەوەو دەریشکەوت درۆت کرد، یەک چا چییە بۆت ناهێنم، جا ئیتر ئەو دەستە بخە پشتی سەرت.

ئەردەڵان: ئاخر وا مەکە پێت داخەم؟!

# (( ئەڵقەی پەنجاو دوو))

هاوڕێ: وەڵاهی نەک تۆ، باوکی ڕەحمەتیشت ناتوانێ بۆ یەک دەقەش چییە پێم داخا.

ئەردەڵان: بۆ گوندە، چی ئەکەی؟

هاوڕێ: هەموو ئەم دوکان و بازاڕە ئەهێنمە سەرجادەو موزاهەرە ئەکەین.. ئەڵێین کەڵەگایەکمان لێ پەیا بووە لە کاروکاسبیمان ئەکا.. ئیتر ئەوسا خۆت ئەزانی سزای ئاژاوەنانەوە چییە؟ ڕێک و پێک بۆ چاکسازیی گەوران، کە ئەبووایە تۆ هەر لە کۆرپەییەوە بنێردرایتایە بۆ چاکسازیی ساوایان.

ئەردەڵان: چاک فێری دەمهەراشیی بووی هەتیو؟!

هاوڕێ: ئەڵێی تازە ئەمناسیت.. بۆ من هەروا نەبووم؟

ئەردەڵان: دەی بە چی ئاشت ئەبیتەوە؟

هاوڕێ: ئافەرین، ئەئاوهاهی ئاقڵبەو لە خۆم بپرسە.

ئەردەڵان: دەی بەچی؟

هاوڕێ: ناڵێم بە عەرەبانەکەتەوە وەرە، ئەلحوکم و للە کاکە هەر بەم جلانەشەوە وەرە کە هەر ئەڵێی قیستی تیاماوە.. دێیت و بە ئاقڵی دائەنیشیت و زەمی کەسیش ناکەی.. ئینجا پاش ماوەیەک کە زانیم، خراپ نیت ببیە مشتەریی.. وەرت ئەگرم و چات بۆ ئەهێنم.

ئەردەڵان: ئاخر بۆ من جوان نییە هەر حەزم لە چاکردو ڕاکەم بۆ ئێرە.. خۆت ئەزانی چەند حەزم بە چای تۆیە.

هاوڕێ: من هیچ جیاوازییەک نابینم لەگەڵ جارانتا، ئەی بۆ جاران پێت عەیب نەبوو؟ ئێستا عەیبە؟.. کورە بەرە بەرە پارە کۆکراوەکانت دەرخستایە، وەک کابرا.. با وات بەسەرنەهاتایە.

ئەردەڵان: ئەک خوا لە ناوی دەمی کابرا با باشە، ئەڵێی قوتوی ساردییەو لەبەرخۆرا کاڵ بۆتەوە.

هاوڕێ: نا تۆ جوانی، ئەڵێی ڕەسمی سەر قتعەی ئەڵغامەکەی هههە.

ئەردەڵان: دەی بەسە دەمەدەم.. لە ئێستاوە دەست پێ ئەکەینەوە.. بێنە چایەکم بدەرێ.

هاوڕێ: ئای خوایە کە گێژی؟!

ئەردەڵان: بۆ؟

هاوڕێ: ئاخر ئەوەندە گێژو نەگبەت نەبوویتایە، ئەم هەموو منەتەت بۆ هەڵئەگرت؟.. خۆ ئەوەش چاخانە بوو لەودیوتەوە، هەر دوو هەنگاو دوورترە، بەوت بوتایە بۆت بێنێ.

ئەردەڵان (( هەڵئەسێ)): ئەهـ بەزاتی خوا لە فیکری ئەوەیا نەبووم.. ئەڕێ خۆ ڕاست ئەکەی (( بەخێرایی ئەڕواتە ئەودیو و لە چاو ون ئەبێ و هاوڕێ پێئەکەنێ بە کوڵ))

Cut

دیمەنی – ١٠٧٦ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین و ڕاهۆز دانیشتوون، لەسەر نەخشەیەکی دەستکرد مناقشە))

ڕاهۆز: گەورەم بە نسبەتی ئەردەلانەوە، گۆڕانکارییەکەی لەپڕەو کەس چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەکردووە.. هاوڕێی جیاواز لە ژینگەی خۆی هەیە ئێستا.. ئێستا ئاوا لە کۆمپانیاکە نییەو کچێکی نەناسراو زوو زوو سەردانی ئەو ڕەوەزە ئەکا، کە ئاوا لەبری خۆی داینراوە.. کاک حەمەخدر بە پێی سەرچاوەی خۆی ڕای وایە، جموجوڵی نائاسایی لەو کۆمپانیایەدا هەیە.. ئەمە دوایین ڕاپۆرتە.

سەرکۆ: ئەی نارەوەن؟ ڕاپۆرتی بە کەڵکی هەیە؟

ڕاهۆز: گەورەم ئەو لەسەر کوشتنی زاواکەی تێبینیی وردی هەیەو بەدوای سەرچاوەی سەروماڵیدا ئەگەڕێ، لە کاتێکا خۆی دەست کورت بووەو سامانێکی زۆریشی بۆ کچەکەی خەرج کردووە.

کۆژین: گەورەم پێ ئەچێ دارەوان دوو گروپی لەدوای خۆی جێهێشتبێ.. ڕێی تێ ئەچێ خۆیان بە مەبەست ئەم گروپەیان بە هەڵەدا بردبێ، تا گروپەکەی تری پێ بشارنەوە.

سەرکۆ: مەبەستت ئەوەیە کاری گروپی دووەم مەترسیدارتر بێ؟

کۆژین: تەنها ڕایەکە، وا بزانم ڕێی تێ ئەچێ.

سەرکۆ: بۆ نا؟ بەڵام ڕاپۆرتەکان شتی گرنگیان تیایە.. پێتان چۆنە دووبارە دابەشی بکەینەوە بۆ دوو ناوچەو هەریەکەتان سەرپەرشتی ناوچەیەکیان بکەن.

ڕاهۆز: مەبەستت کام دوو ناوچەیەیە گەورەم؟

سەرکۆ: کۆمپانیاکەی ئاواو تازەکەش ئەوی حمە خدرو نارەوەن.

کۆژین: سەرچاوەی لای کۆمپانیاکەی ئاوا، پەیوەندییان بە حەمە خدرەوە هەیە.

سەرکۆ: باشتر.. کەواتە خدر بگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیاکەی خۆی و نارەوەنیش لەم تازەیە بمێنێتەوەو یەک دوویەکیش ئەخەینە لای ئەم، بێ ئەوەی خۆی پێی بزانێ.

ڕاهۆز: گەورەم پاسەوانی تەلارەکە لای منە.. وریایە.

سەرکۆ: کەواتە ڕائید کۆژین تۆ سەرپەرشتی نارەوەن بکەو نەقیب ڕاهۆز تۆش حەمەخدر.. لای خۆتان بنوسن، ناوچەی خدر بە ئۆپن بناسێنن و ناوچەی نارەوەنیش بە جێنەڕاڵ.. لەمڕۆوە دەستبەکار بن.

کۆژین: گەورەم یەکتر بینینیان ڕێ پێدراوە؟

سەرکۆ: بۆ زۆر حاڵەت، نەک هەر ڕێگەدان، بەڵکو وا بکەن یەکتریش ببینن، بۆ ئەوەی هەست نەکرێ، شتێک لە پشتی دابڕانیانەوە هەیە.

کۆژین: ئەمانە لە ڕیشە هەڵنەکێشرێن، خەڵک ئاسوودە نازی.

Cut

دیمەنی – ١٠٧٧ – ڕ/ن - ئۆفیسی نیگار:

(( نیگار دانیشتووەو شەنیا کەمێک خێرا دێتە ژوورەوە))

شەنیا: پورو دایک و کەس و کارەکەم؟!

نیگار: خێر یا اللە ئەوە ئیشت پێمە.. ئەمرکە.

شەنیا: نا ئەمەیان تەنها موحیبەت بوو.

نیگار: نا باوەڕ ناکەم، هههە زۆر بەخێرایی هاتی.

شەنیا: خۆم ئەزانم نیگەخان گوڵی خۆم چەند زیرەکە.

نیگار: دەی فەرموو جانانە.

شەنیا: هەر چارەکێکم پێ ئەچێ زۆر نا، ئەچم بزانم ئەو مارکێتە کردوویەتیەوە؟ ئەگەر پێمچوو تێلت بۆ ئەکەم.

نیگار: جا ئەوە پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە، کە ئیشت لەبەردەستتا نییە بۆ ناچی؟

شەنیا: کاک ڕەمزی لێیە خەمم نییە، بەڵام جوانترە تۆش ئاگادار بی.

نیگار: قوربانی تۆ بم.

Cut

دیمەنی – ١٠٧٨ – ڕ/ د – سەرجادەوبان:

(( دەوران گۆرانی بیانی لێ ئەدات و بە سەیارەکەی بەرەو جێیەک ئەچێ.. لەگەڵ گۆرانییەکەدا ئەیڵێتەوە.. زەنگی بۆ دێت))

دەوران: های هەستی.

هەستیی(( دەنگ)): ئەوە لە کوێی؟ هاتم لە کارگە نەبووی.

دەوران: جەوەکەشت لێ تێکدام.. بۆچی هاتی؟

هەستیی: بیرم ئەکردی.

دەوران(( بنێشت جوین و سوعبەت)): وەی قوزەڵقورت قەت فێری هیچ نابی.. بەم بەیانییە وەختی بیرکردنە.. بچۆرەوە بۆ ئۆفیسەکەی خۆت کە تەواو بووم سەرێکت ئەدەم درۆزن.. ئەزانم بیرم ناکەی، ئیشی تازەت کردووەو ئەتەوێ نیشانی منی بدەی.

هەستیی: شتێکم بۆ هێنابووی لە کیست چوو.. ئەگەر هاتی ئەیبینی.

دەوران: دەی باشە ئەزانم ئەوەندەش موهیم نییە هههە.. بای.

(( دائەخەتەوەو سپیکەر ئەچێتەوە سەر گۆرانی))

Cut

دیمەنی – ١٠٧٩ –ڕ/ن –کۆمپانیای ئاوا:

(( گوڵزار بە جلێکی کەمێک وروژێنەرەوە لای ڕەوەزە، کە لە جێی ئاوا دانیشتووە))

گوڵزار: واو ناوەکەشی خۆشە.. ئەردەڵاااان؟؟؟؟ گەنجە؟

ڕەوەز: ئەوە جوانترین وێنەیەتی.

گوڵزار(( سەیری ئەکا)): یاااااع.. ئەوە چییە؟

ڕەوەز: ئەوە ئەردەڵانە هاهاها.

گوڵزار: کورە ئیمانت بێ چۆن ببم بە هاوڕێی شتی وا.. ئەوە بە تەنیش تلیاکم بۆ بێنێ لە دەستی وەرناگرم.. ئەوە بەڕاستتە؟

ڕەوەز(( تورە))؛ ئەوە ئیشە ئیش، زیاد نەڵێی ها، هەردوو چاوت دەردێنم.

گوڵزار(( خەندە)): سوعبەتم کرد، تۆش ئەوەندە کەم چکەڵدانەی.

ڕەوەز: بە ناوی شتێکەوە بچۆ بۆ دوکانەکەی، خۆتان بە یەکتر بناسێنن.

گوڵزار(( بە جرپنیی هەڵئەسێ)): خەمت نەبێ، گێژی ئەکەم.

ڕەوەز: ئەم سەفەرە ئەو پۆدرەکە ئەهێنێ، لەگەڵ تۆو زاهیدا.

گوڵزار: بە خۆشحاڵیی زۆرەوە، کەواتە لە ڕێگە بێتاقەت نابین.

(( ڕەوەز سەربائەداو پێ ئەکەنێ و گوڵزاریش جانتا ئەدا بە شانیاو ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو ئامۆ دانیشتوون))

ئامۆ: ئەگەر بۆ قسەکردن لەسەر شەنیا داواتکردووە بێم، هیچ قسەم نییە تریفە گیان.. ئیشم زۆرە لە نەخۆشخانەکەو ئەو پیاوەم تەنیا کردووە.

تریفە: ئامۆ گیان، هەندێ کێشەو باس هەیە پێویستیی بە تێگەیشتنە، تۆ لە خۆتەوە پێ لەسەر ئەو ڕایەی خۆت دامەگرە، کە ڕەنگە هەڵە بیت تیایا.. تۆ ژیری، گومانم لە کامڵیی ئەقڵت نییە، بەڵام جارێکیترو دەرفەتێکیتر هیچ لە تۆ کەم ناکاتەوە، بە پێچەوانەوە ژیرییت ئەسەلمێنێ.

ئامۆ(( بێ حەوسەڵە)): خوشکەکەم، چاوەکەم.. من هەموو قسەی ئەو کچەم لەبەرکردووە، بەڕاستی ناشمەوێ جارێکیتر خۆم لە خۆشەویستی هەڵسومەوە، بە تایبەتیش شەنیا، کە دڵم لێی هەڵکەنراوە.. ئەوسا ئەگەر هاوسەرگیریش بکەین، بۆ ئەوە نەک من.. بە کورتی من نامەوێ و پێشتریش نەمویستووە دوای کەژێ، دڵ بە هیچ کچێکیتر بدەمەوەو هۆگری بم.. ژیانی خۆشەویستیی من بە کۆتایی هاتنی کەژێ، کۆتایی هات بەقوربان.. توخوا ئیتر ئەوەنەم لەگەڵ مەڵێ.

تریفە: ناکرێ هەر لەبەر منیش یەکجاریتر لەگەڵیا دانیشیتەوە؟

ئامۆ: زۆر ببورە کە ناتوانم.. ئەو کچە جگە لەوەی هەر لە سەرەتاشەوە بەوجۆرەی کەژێ خۆشم نەویست، دواتریش گەمەکەرو فرتوفێڵباز دەرچوو.. ڕاستیەکەی هەر نامەوێ ناویشی ببیستمەوە.

(( شەنیا دێتە ژوورەوەو دوای سڵاو و وەڵامی گەرمی تریفەو ساردی ئامۆ))

ئامۆ: ئێوە ئیسراحەتی خۆتان وەرگرن، کاک زوبێر تەنیایە، ئەبێ بگەڕێمەوە بۆ لای.. خواحافیز. (( خواحافیزیی ئەوان و چوونە دەرەوەی ئامۆ.. شەنیا خۆی بەکێش ئەکا بۆ لای تریفەو ئەچێتە پەنایەوە))

شەنیا: ها بەساقەوبم، قسەت لەگەڵا کرد؟

تریفە (( ئاهـ هەڵکێشان )): بەڵێ.. هیچ سوودی نەبوو.

شەنیا: ئەو کوڕە بۆ وا ئەکا؟

تریفە: هەر لەژێر کاریگەریی کەژێی کۆنە خۆشەویستیایە، ناتوانێ بێتە دەرەوە.

شەنیا: ئەو چۆنە بۆ ئەو کەژێیەی باسی ئەکا، من وێرانترم بۆ ئەو.. خۆ تا دنیا دنیا بێ ڕوویەکیشم نەداتێ وەک ئێستا، من بێ ئەو ناژیم و سەری سپییم بە کچێنیی ئەهۆنمەوە.. ئیتر با هەروا ڕەق بێ لەگەڵما، هیچ گوێی پێ نادەم.

تریفە: زۆر بەداخەوە، ئەوی دڵ ئەیخوازێ مەرج نییە دەستی بکەوێ.. ئێهـ ئیتر ئەوە ژیانە.

شەنیا: باشە بەساقەوبم ترێکەی خۆم، هەر باش بوو بینیشم، ئەوەش کەم نەبوو.. ببورە ئەبێ بگەڕێمەوە بۆ کارگە، بەخوا دڵم خەبەریدابوو ئەیبینم، بۆیە بە مۆبایل داوای وەڵامەکەم نەکرد.. وتم خۆم بچم باشترە، سا ئەمە خوایە لەوێ بیبینم.

تریفە: کەواتە چاوودڵت ڕوون.

شەنیا (( بەدەم ڕۆشتنەوە )): چاو ئا، بەس دڵم ڕوون نەبۆوە.. بای!

(( چوونە دەرەوەی شەنیاو بێتاقەتیی تریفە ))

Cut

دیمەنی – ١٠٨١ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( گوڵزار بە دڵخۆشیی و هەنگاوی کچانەی عەجول و دەست بە قژا هێنانەوە، لە کۆمپانیا دێتە دەرەوەو ئەردەڵان بەرەو کۆمپانیا ئەچێت و خدر بەوێدا تێپەڕ ئەبێ))

گوڵزار(( بۆ ئەردەڵان)): های!

ئەردەڵان: وەی های و سەرچاوم گوڵەخان.

گوڵزار(( بەشان بادانەوە ئاوڕێک)): مێرسی. ثانکس.

ئەردەڵان: کچێ هەی ئەوانیشت سەرچاوەکانم.

(( گوڵزار پێئەکەنێ و تەماشایەکی خدریش ئەکاو ئەڕوا، ئەردەڵان لە دواوە سەیری ئەکاو دواتر خدر ئەبینێ))

ئەردەڵان: وەی باوکی خۆم ڕۆ کە جوان بوو، ئەمانەشمان هەیە؟؟؟؟ (( خدر ئەوەستێ و ئەردەڵان ئەیبینێ)) چییە بۆوا سەیرم ئەکەی؟ وا ئەزانی هەر خۆت قات لەبەرکردنت لێدێت؟

خدر(( سەرسوڕمان)): ئۆو ئەردەڵان ئەمە تۆی؟ باوەڕ ئەکەی نەمناسیتەوە؟

ئەردەڵان: ئەی تەبعەن باوەڕ ئەکەم، چونکە تۆ وائەزانی ئەردەڵان هەر ئەبێ کۆپانی بەشانەوە بێ.

خدر: نا نا خراپ تێمەگە ئەردەڵان گیان، من و تۆ براین، هەموو کەسێ ئەگۆڕێ.. خۆ منیش هەر یەک دوو مانگە عەرەبانەکەم فڕێداوەو دام بە برازاکانم.. چۆنی ئەحواڵت؟

ئەردەڵان: من باشم و زۆر باشتریش ئەبم حەمە خدر.. دوکانی شیرینیشم داناوە.

خدر: ئەی کوا شیرینییەکەی، پاقلاوەیەک، برمەیەک، کورە زولوبیایەک؟

ئەردەڵان: جا تۆ هاتووی تا دەمت شیرینکەم؟

خدر: دەبڕۆ با با ئێستا بچین و دەمم شیرینکەو منیش دیاریی خۆمت بۆ بێنم.

ئەردەڵان: من هەموو پارەکانی کاتی حەماڵییەکەم دەرهێناوەو خەرجی ئەکەم، ئێستا زۆرم هەیە پێویستیم بە پارەی کەس نییە.

خدر: کورە هەی کەر پارە ناڵێم، دیاری دیاری.

ئەردەڵان: ئیتر ئەو سوعبەتانەی جارانیشم لەگەڵ مەکە، پێمخۆش نییە.

خدر: بەسەرچاو، ببورە.. دەی با بچین.

ئەردەڵان: وەڵا تۆزێ ئیشم هەیە لای کاکە ڕەوەز، دوایی کە هاتمە خوارەوە، تۆ لە ئۆفیسەکە بە دێم بە شوێنتا.

خدر: بەڵێ باشە لەوێ ئەبم زوو بێیتەوە. (( خدر ئەڕوا ))

ئەردەڵان: باشە زوو دێمەوە.. سەگبابە کە ئەیبینی چۆن خۆی شیرین ئەکا؟ بەخوا خۆ دڵیشم نایەت ڕقم لێی بێ.. جا بۆ ڕقم لێی بێ ها؟ ڕێی چی لە من گرتووە. هەر پۆزم بەسەرا لێ نەدا.. ئیتر کێشەی چیم هەبێ لەگەڵیا؟.. خۆ جاران نییە بارەکانی من ببا بۆ خۆی؟ هههه. (( ئەچێتە کۆمپانیاکەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٢ – ڕ/ د – نەخۆشخانەی زوبێر- ژووی ئامۆ:

(( ئامۆ سەرقاڵی ئیشە.. دەوران دێتە ژوورەوە))

دەوران: سڵاو هاوڕێ.

ئامۆ (( لەبەری هەڵئەسێ بە خۆشییەوە)): ئۆو سەرچاو دەوران گیان، بەخێر بێی.

دەوران: هەروا تەنیای؟

ئامۆ: من چێژ لە تەنیایی وەرئەگرم، هەر یەکێکم لەگەڵا بێ ئیترنازانم ئیش بکەم هەهە.

دەوران: ئێ کاکە تۆ خوا پێیداوی ئێمە چی؟ بڕۆم؟

ئامۆ: نا تکایە ڕۆشتنی چی؟ بۆ ئەوە وام نەوت بڕۆی.

دەوران: ڕاست، ئیشت زۆرە یان کەم؟

ئامۆ: زۆر نییە.

دەوران: دە فشەیە دوایی تەواویکە، میوانت هاتووە میوان.

ئامۆ: میوانەکە سەرچاو (( ئەوراق دائەخا)) ئەوە منیش دامخست.

دەوران: دەستت خۆش بێ.. من زۆرم پێناچێ ئەڕۆم، هاتووم بۆ لای دکتۆری ئێوە.

ئامۆ: خێر خۆ نەساغ نیت دووربێ.

دەوران: هیچ نییە فشەیە، سکچوونێکی سادە.. وتم با بۆ یەکەمینجار شتێکم لێ هەڵکرێنن.

ئامۆ: هەهە یەعنی وا هاتووی پارەش بدەی؟ بەخوا چاکە.

دەوران(( دەنگی خۆ نێرکردن)): پارەی چی ئاقڵ گیان، تەواو بووم هەر ئەنجامەکە وەرئەگرمەوەو ئەیبەمەوە بۆ دکتۆرەکەو هیچیتر.

ئامۆ: نرخت پێ چۆن بوو؟

دەوران: ڕاستییەکەی کێشەی نەبوو، لە شوێنانیتر کەمترە.. دیارە ئێوە خێرەومەندن.

ئامۆ: کاتەکە وا پێویست ئەکا.

دەوران: ئەڵێی فەقیرحاڵیش هیچتان نییە بیخۆنەوە؟ ههە. ئای لەم نەخۆشخانەیە؟!

ئامۆ: جا هاروهاج تۆ هیچت بیر هێشتم.

(( زوبێر دێتە ژوورەوە  بە گەرمی هەواڵی ئەپرسێ))

زوبێر: ئۆو ئەوە هاتووی کچە جوانەکەم.

دەوران: بەڵێ باوکە تازەکەم، هاتووم.

زوبێر: کچم باوکی تازەو کۆن کوا هەیە؟ باوک هەر باوکەو تەواو.

دەوران: ئاخر باوکە تازەکەم، من باوکە کۆنەکەم مردووەو ئێستاش بە ناچاریی تۆ ئەکەم بە باوکی خۆم.

(( زوبێر بە سوعبەتەوە بە ئاماژە وەک خۆی عاجزکا))

ئامۆ: وازی لێ بێنە جەوی هەیە، نەخۆشە.

زوبێر: بۆ نەخۆش جەوی بۆ دروست ئەبێ؟

دەوران: ئەی چۆن؟ هیچ نەبێ سەعاتێک لە ئیشە دووبارەکەم دوور ئەکەومەوە.. هەموو ڕۆژێک بە هەمان ڕیتم دێین و ئەچین.

زوبێر: ناهەقت ناگرم، بەڵام گەر نەیدەیتە فەرامۆشیی و تەممەڵی نەکەی، ئەتوانی خۆت گۆڕانکاریی تیا بکەی.

دەوران: ئەی ئەوە نییە هاتووم.. (( بۆ ئامۆ)) دەی ڕەزیل شتێکم بۆ بانگکە.

(( پێکەنین)) ______ Cut ______

دیمەنی – ١٠٨٣ – ڕ / د – بەردەم ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر کەمێک لەگەڵ هاوڕێ وەستاوەو پێکەنین.. دواتر ئەڕوات بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەچێت و دەرگا ئەکاتەوە، دەنگی تریفە دێت فەرمووی لێ ئەکا.. لە دوورەوە ئەردەڵان بەڕاکردن دێت و بانگی ئەکا ))

ئەردەڵان: حەمە خدر! کاک حەمە خدر.

خدر(( ئاوڕ ئەداتەوەو بۆ تریفە)): ئێستا یەمەوە تریفە خان (( دەرگای ئۆفیس دائەخاتەوە)) وەرە ئەردەڵان، با بڕۆین.

ئەردەڵان (( ئەگاتە لای)): بەخوا لەبەر تۆ زۆر بە خێرایی قسەم لەگەڵ کردو بە ڕاکردن هاتم.

خدر: باشە تۆ شیرینیت هەیەو ئەو کۆمپانیای بازرگانی، چی پێکەوە کۆتان ئەکاتەوە؟

ئەردەڵان: تۆ عیلاقەی ئەوت نەبێ، برادەرە برادەر.. با بڕۆین دوکانەکەم ببینە!

خدر: فەرموو پێشکەوە.

(( ئەڕۆن بەرەو دوکانەکەی))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٤ – ڕ / د – قاوەخانەیەک:

(( دڵنیاو سەرچڵ ))

سەرچڵ: ژیانیش بێ بایەخە دڵنیا گیان، لە خەیاڵی کێیا بوو ڕاماڵ وای بەسەربێ؟ ئەزانی ئەو فیشەکانە بەر خۆم بکەوتایە لەوم پێ خۆشتر بوو.. ئێستا زۆر زۆر بێتاقەتم بەوەی کارگەکەم لێهەڵگرتەوە.

دڵنیا: بۆ کارگەکەشی فرۆشت؟

سەرچڵ: ڕاماڵ ئەو بووەیە نەبوو کە خۆی دەرئەخست، هەر هەفتەیەک بەر لەوەی تیابچێ، هانای بۆ هێنام وتی هەرچۆنێکە کارگەکەم بۆ بخەرە مەزادەوە، ئەو کچە زۆر پێی داگرتووەو منیش ئەمەوێ هەرچییەکی ئەوێ بۆی جێبەجێ بکەم، کە زانیم نرخەکەیم پێ هەڵئەسوڕێ، خۆم کڕیمەوەو هەر زۆر بە پەلەش لەوەی ببێ بەناوی منەوە، هەر ئەتووت ئەیزانێ ئەوەی بەسەر دێت.

دڵنیا: وەیش توخوا داماوە!

سەرچڵ: ئێستا نازانم چۆن دڵم بیهێنێ کارگەی ئەو بکەمەوەو بە چ حەیایەکەوە بچمە شوێنەکەی، بەڕاستی قورسە.

دڵنیا: مەگەر بیفرۆشیتەوە، لە هەستت تێئەگەم چۆنە دڵەکەم، بۆ کەسی ویژدان زیندووی وەکو تۆ، هەر ناشتوانێ بچێتە ئەو کارگەیەوە.

سەرچڵ: سوپاس کە تێم ئەگەی.. دەی خۆ ئاواش ناکرێ، بێ ئیش و بێکار، مەعرەزەکەشم بۆ پڕکردنەوەی پارەی ڕەحمەتیی فرۆشت.

دڵنیا: تۆ پارەت پێ بێ ئیش زۆرە، جارێ پەلەت چییە؟ با ماوەیەک ژیان بۆ خۆم و خۆت بێ.

سەرچڵ: پەلەم نییە، بەڵام گەر ئیشیشم بەرگوێ کەوت، پێکەوە دەستی ئەدەینێ.

دڵنیا: زۆر باشە، ئامادەم. ______________ Cut ______________

دیمەنی – ١٠٨٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( نیگارو دەوران، جلوبەرگی دەوران بە ڕاکواری دیمەنی – ١٠٨٢ - ))

دەوران: بۆ هیچی تیایە؟ کوڕێکی زۆر باشە دایە، هیچ سەرنجێکی خراپم لەسەری نییە.

نیگار: کچی دایەی مەبەستم ئەوەیە، هەست و شتی وات بۆی نەبێ، بە کەڵکی تۆ نایەت.

دەوران: خۆی هیچ هەستێکی خۆشەویستیم بۆی نییەو قەت ئەوەش دروست نابێ، چونکە من حەز بەوجۆرە تایپ و ستایڵە ناکەم.. بەڵام بۆ بەکەڵک نایەت؟ خۆ شتێکی شارەوەت لانییە.

نیگار(( خۆ خڵافاندن و مەوزوع گۆڕین)): تۆ پێم بڵێ زوبێر چۆن بوو؟ پێی خۆش بوو چوویت؟

دەوران(( حرص)): دایکە وەڵامم بەرەوە، ئامۆ هیچی هەیە؟

نیگار(( شڵەژان)): نا نەوەڵا کوڕێکی باشە، دەی تۆ ئەوت بۆچییە؟ ناڵێی بەدڵم نییە؟ ئیتر بۆچی باسی خەڵک بکەین؟

دەوران: دایکە من ئەمەوێ هاوڕێکانیشم باش بناسم، لەگەڵ هەموو کەسێکا تێکەڵ نابم.. وا خەریکە ئەو کوڕەش ئەبێ بە هاوڕێم و متمانەی پێ ئەکەم، چ شتێکی هەیە، نەک ئەوەندە خراپ بێ نەتوانم لێی نزیک بمەوە؟

نیگار: نا تەنها بۆ خۆشەویستی بۆ تۆ دەست نادا، ئەگینا چۆن لێی نزیک ئەبیتەوە، نزیک ببەرەوە کێشەی نییە.

دەوران: ئەها تێگەیشتم.. زانیوتە خۆشەویستی هەیە.. جا ئەوە چ کێشەی منە؟ تەنانەت ئەزانم باوکیشی لەسەر چی لەسێدارە دراوەو هیچ گوێم نەداوەتێ، هەرکەس خۆی کەوتووە.

نیگار: ڕێک هەموو شتێک ئەزانی بەقوربانت بم.. هەر ئەوەیە خۆشەویستیتری هەیە.

دەوران(( هەڵئەسێ و خەندە)): منیش چاوم لەسەری نییەو بێخەمبە بۆی نەسووتاوم هەهە.. بای ئەچمەوە بۆ کارگە.

نیگار: ئافەرین.. لە ئامانەتی خوادا بی کچە شیرینەکەم.

(( دەوران ئەڕوات و نیگار هەردوو دەستی بە سنگیا لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەهێنێ و سەر بەرز ئەکاتەوە، ئاماژە بەوەی بڵێ سوپاس خوایە ڕزگارم بوو لەو احراجییە))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٦ – ڕ/ د – بەردەمی کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن بێ ماکیاژو بە جلی شینی نیللیەوە بەرەو کۆمپانیا ئەچێت و دیدەوان دێتە خوارەوە، کەمێک ئەڕوات و یەکتر ئەبینن))

دیدەوان(( بە لوتفەوە)): خۆتان خۆش بن نارەوەن خان، زۆر بەشداری خەمتم خانمەکەم، کۆتایی بەڵاو موسیبەت بێت.

نارەوەن: ئێوەخۆش بن کاک دیدەوان، زۆر سوپاس.

دیدەوان: ئەوە بۆ کوێ خانمەکەم؟ ناشێ بڵێی هاتووم بۆ کۆمپانیا؟

نارەوەن: بە دڵنیایی بۆ ئەوە هاتووم.. حەمە خدر پێی وتم کە کچەکەم زۆر شتی لە کۆمپانیای ئەولا شێواندووەو بە تەنیا ناتوانێ بەڕێوەی بەرێ.. وتی ماوەیەک ئەچمەوە ئەو فێر ئەکەم، تا تەواو شارەزا ئەبێت و ئەگەڕێمەوە.. کە زانیم کەسی لێ نییە هاتم.

دیدەوان: ڕاستە ئەوەی بە منیش وت، لە دوای ڕۆشتنیشییەوە یەک ئیشم بەڕێ نەکردووە.. بەڵام ناکرێ تۆش بەو وەزع و تازێبارییەوە بێیتەوە بۆ دەوام.

نارەوەن: نا کاک دیدەوان، من حەز ناکەم ئیش بەسەرما کەڵەکە بێت و دوای ئەوەش زروفەکە ئەوە ئەخوازێ.. (( ئەیەوێ بڕوا)) ببورە من ئەچمە سەرەوە.

دیدەوان: کەمێکم پێ ئەچێ و منیش ئەگەڕێمەوە.

نارەوەن: سەرچاو.

(( نارەوەن بۆ کۆمپانیاو ئەویش بە پێچەوانەوە ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٧ – ڕ/ د – ناو سەیارەی زوبێر:

(( زوبێر تێل ئەکا ))

زوبێر: منیش حەز ئەکەم ئازیز گیان، دەمێکە دانەنیشتووین.......... ئا ئا ئەی چۆن؟ ........... ساختەچییە پێم ئەڵێ باوکە تازەکەم هههها ........... باشە ئامۆش ئەهێنم با ئەوانیش خۆیان خەریککەن بە قسەوباسی خۆیانەوە............. نا نا ئەزانم، ئامۆش هەر وایوت، هیچی خۆشەویستیان لە نێواندا نییە، هەر هاوڕێن.. خۆ سەردەمی ئێمە نییە.. ئێستا هاوڕێیەتیی شێوەی جیاوازی وەرگرتووە گوڵی گیان.......... دەی ئەوانیش بە دەستوری خۆیان، ئێمە چ کارمان بەوانەوەیە؟.............. باشە گیان، سەعات چوار من و ئامۆ لەوێ ئەبین.......... قوربانی، زۆر سوپاس.......... کاتی خۆش بۆ تۆش.

(( مۆبایل هەڵئەگرێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٠٨٨ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو تریفە))

خدر: نا بەساقە دایکتم بە تەنیا جێنەهێشتووە خەمی ئەوەت نەبێ، چۆن ئەوەی لەگەڵ ئەکەم.

تریفە: دایکم زۆر گوناح و ماندووە کاک حەمەخدر.. بڕوانە چەند بەدەست توندو تیژیی مێردو مشەخۆرەکان و کورە بەدەست ئێمەشەوە ئازاری چەشتووە، کەچی گوێ بەهیچ نادات و بەردەوامە.. زۆرجار بەخیلیی پێ ئەبەم.

خدر: بەڕاستی دایکت گەورەیە.. جا قسەوقسەلۆکی خەڵکیش لەولاوە بوەستێ.. چییان بۆ من و ئەو ژنە دروست نەکردووە؟ باوەڕ بکە دوای مردنی دایکم بێ دایکییم بەهۆی نارە گیانەوە پێوە دیار نییە.. ئەزانی لە زۆربارردا هەستی دایکایەتیی پێ نیشانداوم؟ ڕاستە دایکیشم میهرەبان بوو زۆریش، بەڵام من بەهۆی زروفی تایبەتمەوە کەم بینیومە.. زۆرجار ئەڵێم ئەگەر دایکایەتی وەکو نارەیە، کاشکای ئەبەد دایکمم جێ نەهێشتایە، حەیف لەدەستم چوو، بەو هیوایەی ئەمم بۆ بمێنێ.

تریفە: وەیش توخوا چەند جوانی وەسف ئەکەیت؟.. یاخوا دایکت بەر ڕەحمەتی خواکەوێ و بەهەشتی بە نسیب بێت.. ڕاستە دایک شیرینە.

خدر: تریفەخان خۆت ئەزانی، ڕەنگە بوونی من و تۆش لێرە قسەی لێ بکەوێتەوە.. وا باشترە ئەم ماوەیەی لێرە ئەبم تا جێگەم بۆ ڕێکئەخرێ، بچیتەوە بۆماڵەوە، خەمی ئێرەت نەبێ.

تریفە: نە خەمی ئێرەمە تۆی لێ بیت و نە باکیشم بە قسەی ئەم و ئەوە.. دەمیان بە من ناگیرێ، خۆ لە دایکیشم زیاتر نیین.. (( بێ باکانە)) دە با هەر بڵێن.

Cut

دیمەنی – ١٠٨٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی دیزاینەریی هەستیی:

(( هەستیی گەنجێکی جوانی تەمەن نزیکەی ٢٧ ساڵ.. خەریکی دیزاینێکە بۆ قطعەیەک.. پاش کەمێک دەوران، بە ڕاکواری دیمەنی – ١٠٨٥ – ەوە دێتە ژوورەوە))

دەوران: ئادەی بزانم چیت دروست کردووە؟ هەستیی داهێنەر!

هەستیی: ئۆو بەخێر بێی نوقولێ گیان.

دەوران: کام نوقولانە؟

هەستیی: هی بەرات.

دەوران: بۆ بەرات؟

هەستیی: ئاخر لە بەراتا ئەوەندە زۆرە ئەدرێ بە منالان، ئیتر کە منال لێشی ئەکەوێ گوێی ناداتێ.

دەوران: ئەها.. یەعنی من ئەوەنە بێ بایەخم؟ هەستیی.

هەستیی: کچێ شوکوری خوا بکە پێمنەوتی سەرقاپی ئایس کریم.!

دەوران: بۆ وا ئەزانی پۆرتی شکاوت بەوە هەڵئەگیرێتەوە بێ ئەقڵ گیان؟ جەنابی خۆت نەبوویت چووبوویتە کارگەکەم بیرت کردبووم؟ بێنە دەی بێنە با ببینم، بزانم چیت تێکەڵ و پێکەڵ کردووەو ناوت ناوە دیزاین؟ هەهە لەم دیزاینەرە؟

هەستیی: وەرە سەیریکە، بەڵام کە زۆر زۆر کاری تێکردی، نەڵێی دیواری پێشەوەی کارگەکەم بۆ بکە بەوە.

دەوران: دەی چەنە زۆر مەدە بابیبینم جارێ!!!!! (( سەیری ئەکا)) واوووووو هەتیو ئەمەت چۆن بۆ هات؟

هەستیی: ئەی داهێنەر مانای چییە؟

دەوران: وەڵا پێشی دیوارەکەم بۆ نەکەی بەمە، بە هەموو ژیانم قسەت لەگەڵا ناکەم.

هەستیی: باشە، بەڵام تێی ئەچێ.

دەوران: بۆ ئیشی جوان گوێم لە پارە نییە.

هەستیی: ئا ئەوەتم زۆر پێ جوانە، بە ڕاستی پارە بەس بۆ تۆ باشە، ئەزانی چۆنی خەرج ئەکەی.

دەوران(( بەدەم چوونە دەرەوەوە)): ئەی وایە! نوقوڵی بەرات ڕێزی ئیشی جوانی لایە.

(( ئەچێتە دەرەوە))

هەستیی(( هەڵئەسێ)): ئەوە چییە ناشرین لەدڵتگرت؟ (( هەڵئەسێ و دواى ئەکەوێ، بانگی ئەکا)) دەوران! دەوران!.. شێت و شبر!!!

Cut

دیمەنی – ١٠٩٠ – ڕ/د – بەردەمی کۆمپانیای تازە:

(( هاوکاری ئامۆژنە ڕەعنای چایچی دەستگێڕ، لە بەردەمی کۆمپانیای تازەدا بەدوای بیناکەدا ئەگەڕێت و خۆی ئەکا بە بینایەکیترداو دێتە دەرەوەو دواتر خۆی ئەکا بە کۆمپانیای تازەداو لەبەرخۆیەوە ورتە ورتییەتی))

هاوکار: نا ئەوە نەبوو، تۆ بڵێی ئەمەیان نەبێ؟.. ئای خوایە کە منیش گێژم، خۆ ناونیشانەکەی تەواو پێوتم، کەچی لێم تێکچوو.. دەی ڕەنگە ئەمە بێ.

(( ئەچێتە ژوورەووە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١٠٩١ – متبوع – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( هاوکار دێت و نارەوەن لە ژوورەوەیە، پاش سەلامێکی ساردی یەکتر))

هاوکار: پوریێ گیان چایچیتان ناویێ؟

نارەوەن: جا تۆ ئەزانی چا لێ بنێی باوکە؟

هاوکار: ئیشەکەی خۆم چایچێتی دەستگێڕە، حەز ئەکەی تاقیم بکەرەوە.

دیدەوان(( دێتە ژوورەوە، پارەیەک دەرئەهێنێ بیداتێ)): نا باوکە چایچیمان ناوێ، ها ئەوە بگرە.

هاوکار: خاڵە گیان من خێرم پێ ناشێ، ئەوە بدە بە کەسێکیتر.. من بەدوای ئیشا ئەگەڕێم.

دیدەوان: بڕۆ باوکە گیان چایچیمان هەیەو پێویستیمان پێی نییە.

نارەوەن: کاک دیدەوان چاکەی هەردی بە ڕاستی خۆش نییە، چونکە داماوە چایچی نییەو ناشزانێ لێی بنێ.. ئەڵێم با فرسەتێک بدەینە ئەم کوڕە گەنجەو چایەکمان بۆ لێنێ، بزانین چۆن دەرئەچێ؟.. بەخوا من چاخۆرم حەزم لە چای باشە.

دیدەوان: دەی باشە مادام تۆ ئەمرت فەرموو (( بۆ هاوکار)) بچۆ لای بەردەستەکە ناوی هەردییە، قۆری پێ بڕێژەو چایەک لێنێ، بزانین چی دەرئەچێ.

نارەوەن: ئەڵێ خۆم چایچیی دەستگێڕم.

دیدەوان: گوێم لێی بوو، دوور لە قسەکەی تۆ، کێ ئەڵێ ڕاست ئەکا.

هاوکار: با چاکە بێنم، ئەوسا خۆت بڕیاربە.

دیدەوان: دەبڕۆ بزانین (( هاوکار ئەچێتە دەرەوەو دێتە لای نارەوەنەوە)) ئەوەنە مەدە بەدەم ئەم سەرسواڵکەرانەوە.

نارەوەن: بەڕاستی پێم ناخۆشە ئەوەت وت کاک دیدەوان.. بۆ سەرسواڵکەرە؟ هاتووە پارووە نانێکی دەستکەوێ، خۆ خێرەکەشتی وەرنەگرت.

دیدەوان: ئاخر بە نیازی زۆرترە.

نارەوەن: نا نا قەت بۆ شتی وا لەگەڵتا نیم.. خۆ تۆ بە حسابی کاک ڕەمزی هەژاردۆستی؟!

دیدەوان: بەڵێ، بەڵێ هەر زۆریش.. ئیتر فەرمانی خۆتە لە هەموو حاڵەتێکدا، منیش هەر ڕایەک بوو وتم.

نارەوەن: ئەو ڕایەت لەسەر خەڵکی هەژار بگۆڕە باش نییە.. بەلانی کەمەوە ئەوان وەک زۆرێکیتر چاو نابڕنە ماڵی خەڵک و گیرفانیان بە پارەی ئیف پڕ ناکەن.. ئەوان بە ئارەقەی ناوچەوان خۆیان ئەژێنن و ماندوو ئەبن.. دزیش ناکەن، مەگەر دەگمەن.

دیدەوان: دەی دەی نارەوەن خان کۆمۆنیست نەبی؟

نارەوەن: ئەو شتە چی بوو وتت، تێی نەگەیشتم.

دیدەوان: ئەوە ئایدۆلۆژیایەکە.............

نارەوەن: ببورە من هیچ ئایدیۆلۆژیایەک ناناسم و ناشمەوێ هیچ بم.. بەڵام ئەوەی وتم دیوە ڕاستییەکەی ژیانی ئەوانە.. ئەگەر حەز ئەکەی زیاترت بۆ باسکەم، من هەژاری زۆر ئەناسم.

دیدەوان: نا بەساقەوبم.. منیش نامەوێ باسی کەسم بۆ بکەی.. با بزانین چاکەی چۆن دەرئەچێ و دێمەوە پێکەوە ئەیخۆینەوە گەر لاریت نەبێت.

نارەوەن: ئاساییە لە خزمەتتدام.

دیدەوان(( ئەچێتە دەرەوە)): خزمەت لە منەوە.

Cut

دیمەنی – ١٠٩٢ – ڕ/ د - ماڵی گێلاس:

(( گێلاس بە جلی دەرەوە بە باخەکەدا دێت و ئەچێ تێل ئەکا ))

گێلاس: ئابەساقەی هەناسەیەکت بێ پورێ، باش گوێم لێتە.. ئیشەکەی ئێمە مسۆگەرەو پارەکە وەرئەگرینەوە.. چاوەڕوانی بڕیاری کۆتایی دادگاین ئیشەڵڵا ملیان بکا بە پەتەکەوە.. پارەی حەڵاڵ چۆن ئەفەوتێ نینا گیان؟

نینا(( دەنگ )): دەی یاخوا.. ئەی ماڵی نارەوەن خان چۆنن ئاگات لێیانە؟

گێلاس: وەڵا ڕاستیەکەی لەدوای تەعزێی زاواکەیانەوە نەمبینیون.. بەڵام شوکور بێ کێشە دیارن، گوێم لە ورتەو سرپەیان نییە.

نینا: دەی ئەلحەمدولله، یاخوا هەموو لایەک باش بن.. ئەوە ئاواش دەستت ماچ ئەکات و ڕێزی زۆری هەیە بۆ تۆو کاک ئاکۆو دیار.

گێلاس: تۆش هەواڵی بپرسەو چاوی ماچ ئەکەم.. ئەگەر ئیشێ کارێکتان نییە، بەخوا زۆر ماندووم ئەچم کەمێ ڕائەکشێم.

نینا: هەر کەسێکت نەدۆزیەوە؟

گێلاس: جا کەسم بۆچییە ڕۆڵە؟ ئێستا باش سەری لێدەرئەکەم.

نینا: دەی باشە پورێ گیان ئاگات لە خۆتان بێ.. خواحافیز.

گێلاس: خواحافیزت بێ ماڵەکەم.

(( دوای مۆبایل ئەچێتە ژوورەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٠٩٣ – ڕ – عەسر/ د – قاوەخانە:

(( نیگارو زوبێرو دەوران و ئامۆ، دانیشتوون و قاوەوچایان لەبەردەستتدایە))

دەوران: ئەوە بڕیارمدا بیکەم، دەسەڵات نییە.

زوبێر: تۆ دەعوەتی وڵاتێکمان ئەکەی بۆ ماوەی بیست ڕۆژ، ناوی وڵاتەکەش بڵێ و کاتەکەشی دیاری بکە کچە تازەکەم.

دەوران: خۆی ڕاستییەکەی لە دەعوەت و خەرجییەکەی ناترسم، بەس پێم ئاغزە دایکم و دوو پیاو دانیشتبن، مناڵێکی وەک من دەعوەتیان بکا.

نیگار: شتی وا نییە تازە بەڵێنت داینێ.

دەوران: باش خۆ هیچم نەوتووە، بەڵام بۆ کاتەکەی و ڵاتەکەی پەلەم لێ مەکەن.

(( پێکەنین))

ئامۆ: با بکەوێتە بەهار.. (( بۆ دەوران)) چۆنم بۆت؟

دەوران: بەهاری ساڵی داهاتوو یان ساڵەکەش دیاری نەکەین.

(( پێکەنین))

زوبێر: هەرچەند سەیری کچە تازەکەم ئەکەم نیازی نییە.

دەوران: هەستە ئامۆ با بچین دۆدرمەیەک بخۆین، خەریکە شتێکم بەسەرا ساغکەنەوە.

نیگار: دانیشە ئێرەش دۆدرمەی لێیە هههە.

دەوران: جا توخوا بەمەش ئەڵێن دۆدرمە (( هەڵئەسێ و بۆ ئامۆ)) هەستە دەی، یان تۆش لەمانیت؟!

(( ئامۆو دەوران بە پێکەنینەوە ئەچنە دەرەوە)) ــ گەڕانەوەی هەیە ــ Cut ______

دیمەنی – ١٠٩٤ – ڕ – ئێوارە/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( سەرچڵ و ڕەمزی))

سەرچڵ: پێش ئەوەی دەمانچەکە هەڵکێشم وتی ئای بەخوا باش بوو هاتی ، ئەی ئەو برادەرە کێیە لەگەڵتا؟

ڕەمزی: ئێ ئێ.. دیارە بێ ئەقڵە ویستوویەتی پێت بڵێ ڕەمزی بانگی کردوومەتە ئێرە، وریابە نەک شتێکم لێ بکا.

سەرچڵ: دیاربوو.. هەر زۆر دەبەنگ بوو، کە دەمانچەکەم هەڵکێشا، یەکسەر تاسا.. ئینجا ئەیویست شیرین و فەرهادم لەگەڵا باس بکا.

ڕەمزی(( پێکەنین)): بۆ توخوا ئەیوت چی؟

سەرچڵ: نازانم هیچ تێی نەگەیشتم.. تاقەتی گوێ لێگرتنیم نەبوو نام بەسەریەوە.. من تاقەتی ئەو حەکایەت و شتانەم لەکوێ بوو!!!؟

ڕەمزی: ئەی من پێموت کارگەکەت بە نزیکترین دۆستی خۆتی بفرۆشە، لەسەر قسەی تۆ ئەمزانی هەر تۆ دۆستەکەی.. ئەو چووزانێ دنیا چۆن سەری ئەکا بەقوڕا؟.. ئای دەماغسز!!!.. ئەی ئەو کچەی لەگەڵتایە چی؟ دڵنیاکە.

سەرچڵ: هەرکاتێ بمەوێ هەموو شتێکی پێ ئەکەم.

ڕەمزی: لەگەڵ گوڵزارا لێکیان بدەو ئیشی وردەواڵەی بۆنەکەیان پێ بکە جارێ.. تا زیاتر فێربن باشترە.. لەوانەیە لە داهاتوودا هەردووکیان گەورە بازرگانیش دەرچن، ئەگەر بەقەدەر شەنیا وریابن.

سەرچڵ: یان سەفەرێک ئەکەن بۆ لای کاکە ڕاماڵی گێژوویژ.

(( پێکەنینی هەردووکیان))

Cut

دیمەنی – ١٠٩٥ – ڕ – ئێوارە / د – باخیماڵی نارەوەن:

(( حەمە خدرو نارەوەن))

خدر: نا بێتاقەتی ئیش و کار نیم.. شتێکیترە.

نارەوەن: جا گەر لە منی ئەشاریتەوە، هەر بێتاقەت بە بۆ خۆت هههە!

خدر: چیم لە تۆ شاردۆتەوە تا ئێستا؟

نارەوەن: کەواتە بیڵێ.

خدر: زانیت دوێنێ ئەو کچە بەشوێنما عەوداڵ بوو!

نارەوەن: ئا بەڕاست کێ بوو؟ تریفە باسی کرد، وتی حەزم نەکردووە ژمارەی کاک خدری بدەمێ.

خدر: ئەوە هەرمێی خوشکم بوو، من هەر پێی ئەڵێم هەرمێلە.

نارەوەن: بۆ خوشکیشت هەیە ناشرین لای من قسە ناکەی؟ خۆ من هەر وامزانیوە لە کونە دیوار هاتوویتە دەرەوە، قەت پرسیاری کەسوکارم نەکردوویت.

خدر: ڕاستە.. ئاخر پەیوەندیی من و تۆ هەر لە سەرەتاوە پێویستی بە ناسینی کەسوکاری من نەئەکرد.

نارەوەن: دە ئێستا ئیتر کاتیەتی، هەرچی هەیەو نییە ئەبێ بۆم باس بکەی.

خدر: باشە باسی ئەکەم.. بەڵام ئەمڕۆ هەرمێلە چەند جارێک بە پۆڵا بانگی کردم ئەگەر خراپ نەبووبێ بۆ ئەو شوێنە.. هەرچەندە زۆر ویستم دایپۆشم سوودی نەبوو، هەرمێلە زۆر بێ ئاگا بوو، نازانێ چ کارەم.

نارەوەن: پۆڵا کێیە؟

خدر: پۆڵا ناوە ڕاستەقینەکەمە نارەگیان.

نارەوەن: ئۆووووو یەعنی ناوەکەشت ساختەیە؟ هەر خۆشت ساختە نەبی باشە؟! هههە.

خدر: مناڵ بووم لە دێکەی خۆمان (( کانیا ڕازان))، بەردەوام خەوم بە شارەوە ئەبینی.. باوکم برایەکی گەورەی هەبوو مەعەززەتی زۆر بوو لەلای، ناوی مامە سەلاح بوو.. مامە سەلاحم پیاوێکی شۆڕشگێڕو دادپەروەرو نیشتیمانپەروەر بوو.. ئەو پیاوە یادی بەخێر......

نارەوەن: خوا عافویکا.

خدر: سەلامەت بی.. هەموو ژیانی خۆی لە ڕێگەی خەڵکا بەخشی و چەرمەسەریی دنیای لە پێناوی خەڵکا بەسەرهات.

نارەوەن: ئەو چەرمەسەریی و ئازارانە زۆر شیرینن.

خدر: ئەفسەرێکی پلە بەرز بوو.. هات بۆ لای باوکم و داوای لێکرد لە من و هۆشەنگی برام، کە ئەویش هەر ساڵێک لە خۆم گەورەتر بوو، بیداتێ و خۆبەخشانە بمانخاتە ڕیزی ئەو خۆبەخشانەوە، کە گیانفیدا کردنیان پێ سەربەرزییە لە پێناوی ئارامیی و دادپەروەریدا.. جا باوکیشم ئەیزانی من باسی شار لەسەر دەمم نەئەبڕا.. وتی پۆڵا بەرە، ئەیدەی بەدارا ئەیدەی بە بەردا کوڕ کوڕی خۆتە.

نارەوەن: ئەی هۆشەنگ؟

خدر: ئەو دوای دووساڵ لە دوورکەوتنەوەی من، ڕۆژێک سەرە شوانیی ئەو ئەبێت و ئیتر مناڵیش بوو نەیئەزانی، ڕان و گایەلی دوور بردبوو، مین بەسەریا تەقیەوەو قەزاوبەلای ئێوەی برد.

نارەوەن: وەیش بەداخەوە.. کە کۆستێکی گەورە بووە. زۆر بەداخەوە.. ئەی ئیتر باوکت تۆی لە مامەسەلاح داوا نەکردەوە لە بری هۆشەنگ؟

خدر: نا تۆ باوکم ناناسی.. یەکجار قسە ئەکا.. مامەسەلاحیش ئەیزانی ئازارەکەی زۆر بەسوێیە، یەک دووجار پێی وتبوو پۆڵات بۆ ئەنێرمەوە.. باوکیشم وتبووی ئەوە کوڕی خۆتەو من گفتم داوە، توخوا با ئەویشم لە ڕێی شوانیا تیا نەچێ، لای خۆت و بە پەروەردەی شار گەورەیکە، ئەو حەزی لەشار زیاترە.

نارەوەن: ئای ئەو پیاوانە قسە نادۆڕێنن، ڕاستە. بەڵی فەرموو!

خدر: ئیتر مامم خوێندنی پێ تەواو کردم.. بەڵام لە هەموو ئەو ماوەی خوێندنەیا، شەوانە وانەی دادپەروەریی و خۆڕاگرتن و گوێنەدان بە خۆدەوڵەمەند کردن و پاراستنی گیانی خەڵکی بە من و دیلمانی کوڕی ئەوتەوە.. بەردەوام ئەیوت گەر تۆ بتەوێ خزمەتی ئەم خەڵکە بکەیت؟ ڕێگا زۆرە.. دوای خوێندن کۆلیژی یاساشی بەدوایا هات و تەواومانکرد.. دواتر داوای لێکردین ببینە خۆبەخشی نهێنی لە ڕیزەکانی پاراستنی گەلداو هاوکاریی دەزگا ئەمنییەکان بکەین بۆ ئاشکرا کردنی خەراپەکاریی و ڕاوەڕووتچیی و بازرگانیی کردن بە کەرامەتی خەڵکەوە.. ئێمەش ئەوەمان کرد زۆر بە خۆشحاڵییەوە، چونکە پڕ پڕ بووین لەو مانا گەشانەی فێری کردبووین.

نارەوەن: پیاوێکی مەزن بووە هەزار ڕەحمەت لەو گۆڕەی.. ئەی ئێستا دیلمان لە کوێیە، بۆ نابینم هیچ کەسێک بێتە لات؟

خدر: بەداخەوە دیلمان لە دەستگیر کردنی کۆمەڵە تیرۆریستێکا، لە شەڕا تیاچوو.. ئەویش گرێیەکی گەورەیە لە ژیانما.. زۆر زوو ڕۆشت.

نارەوەن: زۆر بەداخەوە زوو تەنیاکەوتووی.. ئۆو لەو هەموو ئازارەی تۆ چەشتووتە.. ئاخر ئەمە بە کەسێک بە تەنیا چۆن ئەکرێ ئەی هاوار؟

خدر: شتی زۆرم کردو پلەکەشم لە شوێنی خۆی بەرز ئەبێتەوە، بەڵام بەڕاستی گرنگیم پێ نەداوە.. من بۆ پلە ئیش ناکەم و ڕەنگە ڕۆژێک بێت منیش وەک دیلمان تیاچم.

نارەوەن: دەک زمانت بە بڕینچێ، ئەوە بۆ وا ئەڵێی، یاخوا قەت ئەو ڕۆژە کەس نەیبینێ.

خدر: ئەها، یەعنی وەک تیائەچم زمانیشم ببڕدرێ؟ هههههە.

نارەوەن: دە نا، مەبەستم ئەوە نەبوو، بەدەمما هات، ببورە زوو زووش وا بە مناڵەکان ئەڵێم.

خدر: تێت ئەگەم، منیش گاڵتە ئەکەم.

نارەوەن: ئێ بۆم تەواوکە.

خدر: دایکیشم بەسەریا چوو بێ ئەوەی بە سۆزی ئەو تەواو گەورەبم.

نارەوەن: وەی باوکە لەو هەموو کارەساتە، خوا عافویکاو جێی بەهەشت بێ.

خدر: ئەمڕۆ هەندێ قسەم لەبارەی میهرەبانیی تۆوە بۆ تریفە ئەکرد، دڵم پڕ ببوو.. بیری دایکمم ئەکرد.. بیری باوکم، کە ئەبێ بەمزووانە ببینم، ئەگینا باوەڕ بکە هیچ هیچم بۆ ناکرێ.. بەسەر ئەو خوشکە بێنازەمدا گریام، کە زیاتر لە بیست ساڵە، ناوبەناو ئەیبینم و ناتوانم وەک برایەکی گەورەی، دەستێک بەسەریا بێنم.. وا خەریکە شوو ئەکا، خۆی پێ نەگیراوەو بەڕووی سوورەوە ئەو هەموو ڕێیەی بڕیوە تا براکەی بدۆزێتەوەو (( دڵی پڕ ئەبێ)) بەشداریی زەماوەندی بکا.

نارەوەن: ئەوە چیتە مناڵ؟ دەی فینگە فینگ دامەزرێنە.. (( خدر چاوی هەڵئەگلۆفێ)) خۆ من وامئەزانی هەر ئاواو ئامۆ مناڵن.. هەموو جارێک ئەموت چاو لە حەمەخدر بکەن، کەچی ئەگریت؟ وەڵا باوکم ئەوان باشترن هیچ نەبێ ناگرین.. دەی دەی، ئادەی با سەیرتکەم بزانم جوان ئەگریت (( خدر گریان و پێکەنین)) ئەڵێی چی کچەکانیش بانگکەم بتبینن، نەک دووبارەی نەکەیتەوە.

خدر: لەبەرئەوە من بەیانیی و دوو بەیانیی مۆڵەت وەرئەگرم و بۆ زۆر پێویستیی نەبێ، تا هەفتەیەک بانگم مەکەنەوە.. ئەبێ لەوێ بم نارە گیان لەوێ.. خۆ من ڕۆبۆت نیم ژیانم هەموو هەواڵگریی بێ؟

نارەوەن: ئێ باشە کەس نەیوتووە لەوێ مەبە.. مۆڵەت لەوانیش وەرگرەو حەز ئەکەی ئێمەش دێین.

خدر: نا ئەوە خراپە، ئەبێ هەر خۆم بڕۆم.

Cut

دیمەنی – ١٠٩٦ – ش/ د – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٩٣ – قاوەخانە:

(( زوبێرو نیگار))

زوبێر: ئەی چۆن دەرفەتی ئەوەت دا بە هیوا بە بێ دادگا، هەر لە دەرەوە مارەت ببڕێ؟ چۆن کەسی ئاقڵ ئەوە ئەکا؟

نیگار: ئەو پێشتر پێی وتبووم من دوژمنایەتییم هەیەو هەر کە زانییان تۆ خێزانی منیت، دێن و ئەتکوژن و کەسیش فریات ناکەوێ.

زوبێر: ئێ خۆ پیاو قاتیی نەببوو، شووت پێ نەکردایە.

نیگار: ئاخر کەس ئاگای لە دەردی کەس نییە زوبێر گیان.. تۆ لە خۆتەوە ئەڕوانی کە هەبوو بوویت لەخوا بەزیادبێ.. بەڵام من و پیرێژنێکی دایکم یەک سەرچاوەی بژێویی، یەک دەرووی ڕونمان نەبوو.. نانم بۆ ماڵان ئەکرد، هیچ گوێم نەئەدایە.. ئەوە بوو مەستوور بووین..

زوبێر: کەواتە لە چیت کەم بووە؟ ئەمەت بۆ کرد؟

نیگار: داواکارم زۆر زۆر بوو، ئەوسا وەک ئێستا نەبووم، ئەها قژم ئا لێرەیا بوو.

زوبێر: ئێستا جوانیت وایە.. ئەبێ ئەو کاتە چۆن بوویت؟

نیگار: بەخوا نەمئەوێرا بێمە بەردەرگاش.

زوبێر: دەی باشە، ئەی ئەم هیوایەت چۆن ناسی؟

نیگار: ژن و ژاڵ بۆیان هەڵدابووم.

زوبێر: هەروا بە وەسف کردنی ژنان، هاتە خوازبێنیت؟

نیگار: نا جارێکیان لەگەڵ ژنێکا هاتن بۆ وەرگرتنەوەی نان.. دانیشتن و لەگەڵ دایکیشما قسەی کرد، ئەوە نەبێ بە دزییەوە بێ.. بەڵێنی سەراخانوویەکی پێداین و کارگەیەکی پێڵاو دروست کردن و ناوماڵی باش و زۆر شتیتر، تەنها بەو مەرجەی ئەوە قبوڵ بکەین لە دادگا مارەم نەبڕێ.

زوبێر: ئـێ، ئـەی دەوران؟

نیگار: بوەستە باسیکەم.

زوبێر: فەرموو.

نیگار: ئێمەش زانیمان لەو زەلالـەتە دەرئـەچین و خـەمی کرێ خـانوو و نـانمان نـامێنێ.. پەڵپمان لێگرت پێش گواستنەوە هەموو بەڵێنەکانی جێبەجێ بکا.. زۆر بەخێرایی ئەوەیکرد وەک ئەوەی کە وتی.

زوبێر: ئێ بۆ نایکا؟ تۆ ئەزانی چیت بۆ کردووە؟

نیگار: بەهەرحاڵ، بەڵێنی ئەوەشیدا کە هەرکات ڕێککەوت لەگەڵ دوژمنەکانیا، بچینە دادگاش.

زوبێر: مادام وابێ، ڕەنگە نیەتی خراپ نەبووبێ. بەڵێ!

نیگار: پاش ماوەیەک سکم بە دەوران بوو.. خەمی دنیامان لێهات لەبەر پاشەڕۆژی کچەکە.

زوبێر: وایە زۆر زەحمەتە کەسی بێ ناسنامە بخەیتەوە.

نیگار: ئەو وتی ئەم چارەسەرەت بۆ ئەکەم، بەومەرجەی کەس نەیزانێ.. پارەیەکم داوە بە کابرایەک ناوی هیوایە.. ئەتباتە دادگاو بەپێی یاسا غەرامەکەی خۆشی ئەداو ............

زوبێر(( قسەی پێ ئەبڕێ)): غەرامەی چی؟

نیگار: نازانم، وابزانم غەرامەی ئەوە بوو کە لە دەرەوە مارەکرابووم و سکم هەبوو، هەرچۆنێک بێ قەناعەتی پێکردم، بەو مەرجەی من تەنها لە دادگا کابرا ببینم و هیچیتر.

زوبێر: یەعنی خۆت هەر ژنییشی بوویت؟

نیگار: نا نا وا نەبوو، خۆی یەکسەر تەلاقیدام و لە کابرایە مارە بڕام لە دادگا.. بەڵام کابرا نەگەیشتە ماڵەوەو سەیارە لێیداو عەمری باقی بۆ تۆ تۆ جێهێشت.

زوبێر: سەیرە.

نیگار: کورە سەیری چی من لەوە ئەترسام دەستم لێ هەڵنەگرێ هههە.

زوبێر: پێت خۆش بوو مرد هههههە؟

نیگار: نازانم، گوناحیش بوو.

زوبێر: ئەی دواتر کچە کرا بە ناوی هیوای دووەمەوەو هیوای یەکەمیش دەرکەوتەوە؟

نیگار(( غەمبار)): نەخێر، تا ئێستا نەمبینیوەتەوە.

زوبێر: واو.. خۆی شاردەوە؟

نیگار: بەڵێ.. دوای ٢٣ ساڵ ئەو ڕەمزییەی لای من سەرپەرشتیی کارگەکە ئەکا، پێی وتم چی بەسەرهات.. ئەزانی کێ دەرچوو؟

# (( ئەڵقەی پەنجاو سی))

Cut

دیمەنی – ١٠٩٧ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان دانیشتووەو ڕەمزی متواضعتر دانیشتووە))

دیدەوان: ئێستا بە بەردێ دوو چۆلەکە بکوژە.. ئەمە ئەقڵ و وردکارییەکی زۆری ئەوێ ڕەمزی!

ڕەمزی: من تێئەگەم تۆ خەیاڵت بۆ کوێ ئەچێ! بەڵام بەڕای من کاتەکە گونجاو نییە.

دیدەوان: بە پێچەوانەوە.. من ئەوساش و ئێستاش لەگەڵ تاکڕەوییەکەی بیرکردنەوەی دارەوانا نەبووم.. ئەو پێی وابوو، بیرکردنەوە بۆ هەر کارێک پێویستیی بە کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، بەوەش تیاچوو با بزانی... ئەو تەنها ڕێشاری کردبووە جێبەجێکارو هەموو ئێوەو زۆرێکیتریشی فەرامۆش کردبوو، ئەسڵەن هەر دووریشی ئەخستنەوە.

ڕەمزی: بەڕای من ئەوە سەرکەوتنەکەی بوو.. هەموو ئەوانیتریشی پاراست.

دیدەوان: گەوجە پاراستنی چی؟ تۆڕێکی بە تەواوەتیی هەڵوەشاندەوەو هەمووی فرێدایە زیندانەوە.

ڕەمزی: گەر ئەوەی نەکردایە، ئێستا هەموو لە سێدارەدرابووین، یان زیندانیی بووین.

دیدەوان: ئەی ئەگەر تەونی جاڵجاڵۆکەیی نەبێ و هەمووی کار بکا؟

ڕەمزی: وایە، ئەوسا هەر وا یەکێکیان گیرا.

دیدەوان: دەی کەواتە تۆ بۆ ئەوەی هەمووی بخەیتە جووڵە چیت پێویستە؟ هەر کات نییە؟

ڕەمزی: بەڵێ پێش هەموو شتێکت کات پێویستترینە.

دیدەوان: دەمخۆش.. کەواتە بۆ ئەوەی من خدر یان پۆلا وەک خوشکەکەی ئەڵێ.. لە ئێستاوە چواردەوری بکۆڵم و ڕەگ و ڕیشەی بناسمەوە باشتر نییە بۆ ئەوەی لە

داهاتوودا نەبێتە جێی مەترسیی و هەرچیم ئەوێ پێی بکەم؟.. بە تایبەت گوایە پارەو پولی بەسەر فەقیرو مەقیرا ئەبەخشێتەوە؟

ڕەمزی: ئەوە پەیوەندیی چییە بە داهاتوویەوە؟

دیدەوان: پەیوەندییەکە ڕاستەوخۆیە.. ئەوەی ئێستا دەستی ئەکەوێ، شایانی ئەوە نییە بیکاتە سەرمایەداری گەورە، من هەرچی پێ بڵێم.. ئەو هەر دابەشی ئەکا بەسەر ئەم و ئەواو قسە کاری تێ ناکا.. بەڵام کە بلۆکە دۆلارو وەبەرهێنانی ئەوروپاو ڤێللای زۆرو بەرژەوەندیی گەورەی بینی.. زوو دێتە سەرخەت.. ئەوەش بەچی دێتە دی؟ تەنها بە ئیشەکەی خۆمان.

ڕەمزی: زۆر ڕاستە.

دیدەوان: کەواتە هەرچەندە کاتی ئیشکردنی خدر نییەو وەختی نەهاتووە، بەڵام کاتی بیرلێکردنەوەیەتی بۆ داهاتوو.. ئەوەش بەیەکەوە لەگەڵ ئەمەیترا بکەو دەسکەوت بۆ ئێستاو داهاتووشت بچنەوە.

ڕەمزی: زۆر باش حاڵیی بووم.

دیدەوان: مەرجیش نییە کار بە هەموو پلان و بەرنامەکانی دارەوانیش بکەی.. ئەو بەگوێی منیشی نەئەکرد، زۆر بەپەلە تەنها لەو کاتانەدا بڕیاری ئەدا، کە ئیشەکە ئەهاتە بەردەمی.

ڕەمزی: زۆر ڕوون تێگەیستم، هەردوو ئیشەکە بە یەکەوە ئەکەم.

Cut

دیمەنی – ١٠٩٨ – ش/ د – مخزنی کۆمپانیای ئاوا:

Mute

(( بارێک بە پیکاب دێت و ڕەوەزو ئەردەڵان و زاهید دایئەگرن.. ڕەوەز دوو کارتۆنی لێ جیا ئەکاتەوە بۆ سەیارەیەک و ئەوان جێ ئەهێڵێ و ئەڕوا.. ئەوانیش بارەکە دائەگرن))

Cut

دیمەنی – ١٠٩٩ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٠٩٦– قاوەخانە:

(( زوبێرو نیگار))

زوبێر: هههه خۆ من دەرنەچووم؟

نیگار: ئەو ڕۆژەی لە سێدارەدرا ڕەمزی پێی وتم.

زوبێر(( تۆقیو)): کێ؟؟؟؟؟؟؟؟ دارەوان!!!!!!

نیگار: بەڵێ.

زوبێر: جا ڕاستی کرد؟ چۆن زانی دارەوانە؟

نیگار: بەڵێ، ناسیاوی خۆی بوو.. دارەوان خۆی بۆی کردم بە سەرپەشتیاری کارگەی پێڵاوەکە، دواتریش هەر نازانم چۆن، کاتێ زانی ئەو کارگەیە داهاتی کەمە، بەرە بەرە ئەمەی بە شێوەیەکی سەرەتایی دروستکردو تا گەیاندیە ئێستا.. خوا هەڵناگرێ زۆر دڵسۆزمە.

زوبێر: ئەی کاتی خۆی کە دارەوان ون بوو، چۆن پێی نەوتی چی بەسەر هاتووە.. یان بۆ نەیوت ئەوە ناوی هیوا نییەو ناوی دارەوانە؟

نیگار: ئەویش پاساوی خۆی هەبوو.. پێی وتبوو هەر نهێنییەکم بدرکێنی خراپت بەسەر ئەهێنم.. وا بزانم پارەی باشیشی دابوویە.. دوای منیش پەیوەندییان پچڕا بوو.. خۆی وتی.. بە بەڵگەی ئەوەی کە دارەوان و داروەدستەکەشی گیران.. پۆلیس هیچ بانگی نەکرد وەک ناسیاوی ئەو.. وتیشی لەو کاتانەوە نەمبینیوە.

زوبێر: زەمانەکەی بە جۆرێکە بەساقە، کەس بە قسەی کەس باوەڕ ناکا.

نیگار: ئەی خۆ گەر لەگەڵیا بووایە، ئەمیش ئەگیرا.

زوبێر: ئەی بۆ دەوران و ئامۆت لە خوشک و برایەتییان تێنەگەیاندووە.. تۆ ئەزانی یەکتریان خۆش بویستایە، ئێستا چ کارەساتێک ڕووی ئەدا؟

نیگار: بە چەندین شێوە هەستی دەورانم تاقیکردۆتەوە.. هیچ لە ئارایا نییە.. وا ئەزانم لای ئامۆشەوە هیچ نییە، خۆشت ئەزانی.

زوبێر: تازە ئەبێ بزانن.

نیگار: تکایە.. زانینی ئەوان هیچ شتێک ناگۆڕێ.. دەوران توشی شۆک ئەبێت، کاتێ بزانێ کچی تاوانبارێکی وەک دارەوانەو کچی هیوا ناوێکیتر نییە، کە تا سێ ساڵیی لەگەڵیا ژیاوەو زۆری خۆش ویستووە.. من وام تێگەیاندووە.. تکایە نهێنییەکە بپارێزە.

زوبێر: من لە زیاتر نزیک بوونەوەیان ئەترسم، بڕوانە چەند سەعاتە ڕۆشتوون بۆ دۆندرمەیەک و بیری ئێمەیان هەر نەماوە.. پێش ئەوەی ئەو هاوڕێیەتییە ببێ بە خۆشەویستیی، زۆر باشترە بیزانن.

نیگار: باوەڕ ناکەم ببێت.

زوبێر: خۆشەویستیی لە دەسەڵاتی کەسدا نییە نیگار گیان، خۆی دروست ئەبێت و زۆر بە شێنەیی ڕۆ ئەچێت.. تکایە با ئەو دووە تێک نەشکێن، باوەڕ بکە وردو خاش ئەبن و بۆمان کۆناکرێنەوە.. دواتریش هەر ئەبێ بیزانن.

نیگار: ئای خوایە لەم بەڵایە؟!

زوبێر: هەموو شتێک لە بازنەی ئەقڵ و لۆژیکایە ئەگەر بمانەوێ مرۆڤانە بژین.. نەک خۆ وا دەرخەین و بە ئەقڵییەتی کۆن و دواکەوتوو بیر بکەینەوە.

نیگار: یەعنی بەڕای تۆ هەر ئەبێ پێیان بڵێین؟

زوبێر: بەڵێ.. بەڵام بە جۆرێک کەس توشی شۆک نەبێت و ئەو براو خوشکانەش بە یەکتر شاد ببنەوەو یەکتر بناسن.. ئەگەر لێیگەڕێی بۆ من، بە بەرنامە پێت ئەڵێم ڕۆژانە هەردووکمان چی بکەین.

نیگار: ئەی ژنەکەیتری نایکا بە هەرا؟

زوبێر: بۆچی ئەیکا بە هەرا؟ هیچ بارگرانیتان بەسەر یەکەوە نییەو کارتان بەیەک نییەو تۆ لە ماڵی خۆی و ئەویش لە ماڵی خۆی.. ئەوی یەکتر ئەبینێ، براو خوشکەکانن و بەس.

نیگار: ڕەنگە قسەی تۆ بێ.. بەڵام زۆر ئەترسم.

Cut

دیمەنی – ١١٠٠ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دەنگی دەرگا دێت))

ڕەمزی: ئەوە هات.

دیدەوان: زۆر باشە، زوو بەڕێیکە. (( ئەچێتە ژووریکیترو ڕەمزی ئەچێتە دەرەوەو لەگەڵ زاهید دێتە ژوورەوە))

زاهید: بەڵێ تەواومان کردو ڕەوەز دوو کارتۆنەکەی برد.

ڕەمزی: زۆر باشە، ئەردەلانەکەی بەکار هێنا.

زاهید: بەڵێ بەڵێ ئەیچۆن؟ حەماڵێکی باشە.

ڕەمزی: جا ئێستا گوێ بگرە چیت پێ ئەڵێم بۆ بەیانی.. بەیانی تۆ ئیشت لە شارا نییە، ئەچیتە دەرەوەی شارو بە سەیارەی خەت.

Cut

دیمەنی – ١١٠١ – ش/ د – میسر:

(( گەشتی نیناو ئاوا لە شوێنە کولتوورییی یان گەشتیارییی و ناو بازاڕی میسر.. دایالۆگی سەربەست))

Cut

دیمەنی – ١١٠٢ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تریفە سەرقاڵی مۆبایلەو تیرۆژ بیر ئەکاتەوەو نینۆکی ئەکرۆژێ))

**تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

(( نا نایکەمەوە، ئەی ئەگەر وەک ڕاماڵیان کوشت، بێنە سەر منیش.. ڕەنگە فرۆشتنەوەی باشترین بیرۆکە بێ.. پارەکەی ئەخەمە بانکەوەو ساڵێکیتر ئیشێکیتری پێ ئەکەم.. نا کردنەوەی هیچ بە کەڵک نایەت.. با لە تریفەش بپرسم.... ئەقڵی دووان باشترە لەیەک.. ڕەنگە ئەو چارەسەرێکی باشیشی لابێ... یان دایکم و ئەو کابرایەش زۆر سەردەرکردوون، بەخوا هەر لەوان بپرسم باشترە، تریفەی داماو چی ئەزانێ))

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( تیرۆژ هەڵئەسێ))

تریفە: ها؟ بۆ کوێ؟

تیرۆژ(( تورە)): ئەچمە باخەکە، خۆ چوونە لایان قەدەغە نییە؟

تریفە: نا بۆ قەدەغەیە، هەر لە خۆتەوە هەڵئەچی!

تیرۆژ: ئێ خۆ ئێوە بە کچی ماڵەکەم نازانن.. ئەزانن من لە چ وەزعێکام؟ (( ئەچێتە دەرەوە))

تریفە: ئاای خوایە لەدەست وەزعی تۆش.. حساب بۆ قسەی کەس ناکاو تورەش ئەبێ!

(( تریفەش بە دوایا ئەچێتە دەرەوە))

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١١٠٣ – متبوع – ش/ن – باخی ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ نزیک بووەتەوە لە خدرو نارەوەن و تریفەش لە دواوە دەرئەکەوێت دێت))

تیرۆژ(( بێتاقەتە)): یارمەتی هەیە؟

خدر: فەرموو دانیشە.

(( تریفەش داوای یارمەتی ئەکات و دائەنیشێ))

تیرۆژ: ئەمەوێ پرس بە هەمووتان بکەم، بۆ چاپخانەکە.. بەڕای ئێوە کێشەم بۆ دروست ناکا ئەگەر بکەوێتە ئیش؟

نارەوەن: جارێ زووە بەڕای من.. مافی هەرکەسێکی بەسەرەوە بێت، خۆی بۆ ناگیرێ و تا مانگێک هەر دەرئەکەوێ، ئەوسا بەرچاوت ڕوونتر ئەبێتەوە.

خدر: قسەکەی تەواوە.. جارێ با چلەی کوڕەش بچێ، ئەوسا هێمن هێمن ئەبیتەوەو کەسیش ناتوانێ هیچ بڵێ.

تریفە: ئەگەر بەشێکیشی بۆ دایک و باوکەکەی ببڕێتەوە، لە قازانجەکەی.. هەمووان بێدەنگ ئەکا.

تیرۆژ: ئەی چۆنە بیفرۆشم و ساڵێکیتر ئیشێکیتری پێوە بکەم؟

خدر: هەر قسەکەیە تیرۆژ گیان، بۆ ئەوەش زۆر زووە.. جا نەک پارەی خۆی چارەکە مایەشت بۆ ناگرێتەوە.. باشتر وایە دان بەخۆدا بگری ئەم ماوەیەو پارەکەی نەدەی بە ئەرزا.

تیرۆژ(( بۆ دایکی و تریفە)): ئێوە ئەڵێن چی؟

تریفە: بە قسەی کاک حەمەخدر بکە، ڕاست ئەکا.

نارەوەن: ئیتر ئەوە ئێمە ڕێگەی ڕاستمان پێوتوویت و تۆش ئاقڵی و ئەزانی چی باشە، ئەگەر پێمان بڵێی، پێکەوە ئەتوانین باشتر بیری لێ بکەینەوە. ـــــــ Cut ـــــــ

دیمەنی – ١١٠٤ – ڕ/د – بەر دوکانی شیرینیی

(( ئەردەڵان وەستاوەو بە دەنگێکی نەسازی ناخۆشەوە، بانگی ئەحەو کارە ئەکا ))

ئەردەڵان: ئەحە هۆو، کارە هۆو مردووتانمرێ کەڕن گوێتان لێم نییە؟

کارە(( سەیری ئەردەڵان ئەکا، کە قاتێکی شێوای لەبەردایە، دەست بە دەمییەوە ئەگرێت و پێ ئەکەنێ )): بەڵێ، ئەمرکە، وەڵا هەر تۆمان لێ کەمبوویت هەهە.

ئەردەڵان: ئەوە بە چی پێئەکەنی حەماڵی سەرسەریی، ئەزانی لەگەڵ کێیا قسە ئەکەی؟

کارە(( ئەچێتە بەردەمی و بە جددیات )): فەرموو قوربان، ببورە وامزانی حەماڵەکەی لای خۆمانی.

ئەردەڵان: کورە ژەهری مار، ئەو حیلکە حیلک و پێکەنینەت لە چی بوو؟ ئێستا من کاک ئەردەڵانی شیرینیم تێگەیشتی؟ پارەت ئەدەمێ و بارم بۆ ئەهێنی.

کارە: بەسەرچاو.

ئەردەڵان: چەند سینییەک شیرینی و زنود الستم لەو کارگەیەی سەرسووچەکەی بازاڕەکەیە، بچن بۆم بێنن، هەر بە خۆت ناکرێ، ئەحەش بەرە.

کارە(( بە دەنگی بەرز بانگی ئەحە ئەکا )): ئەحە ئەحە وەرە کاک ئەردەڵانی زنود الست باری هەیە، بابچین بیهێنین.

ئەردەڵان: وتم بڵێ کاک ئەردەڵانی شیرینی.

کارە: هەریەکە ئەویش شیرینییە.

ئەحە(( بەڕاکردن دێتە بەردەمی )): فەرموو کاک ئەردەڵانی زنود الست.

کارە: پێت چۆنە کاک ئەردەڵانی زنود الست، ئەو زنودەشت بۆ لێکەینەوە؟

ئەردەڵان: ئەبێ بەچی؟

ئەحە: کاک ئەردەڵانی ست، یەعنی دڵی کچان.

ئەردەڵان(( کەیفی پێ دێ)): بە دڵی خۆتان، هەرچییەک ئەڵێن بیڵێن، ئێستا بچن ئەو سینییانەم بۆ بێنن.

کارە: سەرچاو کاک ست ئەردەڵان. چەند دانەیە؟

Cut

دیمەنی – ١١٠٥ – ڕ/ د – ڕێگای لادێیەک:

(( حەمەخدر بەسەیارەکەی لە جادەی قیرەوە لائەدا بۆ ڕێگایەکی خۆڵ.. زاهید لەوێ وەستاوە، بە جلی کوردییەوە.. دوکانێک، یان چێشتخانەیەک لەسەر جادە خۆڵەکەیە.. خدر سەیارە ڕائەگرێت و ئەچێتە بەردەمی دوکانەکە))

زاهید: بەخوا باش بوو وەستای، سڵاوت لێ بێ.

خدر: سڵاو برا، بۆ باش بوو؟

زاهید: منیش نیازی ئەو دێیانەی ئەو دەورو بەرەم هەیە، ئەگەر لەگەڵ خۆت هەڵمگری.

خدر: زۆر ببورە من بۆ ئەو دێیانە ناچم برا، ڕاست بە قیرەکەیا ئەڕۆم و لادانم نییە.

زاهید: ئەی ئەوە نەبوو ویستت لادەی؟

خدر: نا چاوەکەمیت، لە خزمەتدابووم ڕێم ئەوێ بووایە.. تەنگاو بووم ویستم لەو نزیکانە لابەم خەڵک نەمبینێ.

زاهید: ئەی تا کوێ ئەچی؟ بە ڕاستی من خۆشم نازانم بۆ کوێ ئەچم، بۆ هەر شوێنێک بچی بۆ من باشە.

خدر(( پێکەنین)): کەس هەیە نەزانێ بۆ کوێ ئەچێ؟

زاهید: مەسەلەن تۆ بۆ کوێ ئەچی؟

خدر: زۆر سەیر قسە ئەکەی.. من ئەها (( لە دوورەوە بەرزاییەکی پێ نیشان ئەدا)) ئەو بەرزاییەی ئەوبەرەوە ئەبینی؟ تا ئەوێ ئەچم.

زاهید: کەواتە ڕێمان یەک نییە، بەڵام ئەو بەرزاییە چی لێیە؟

خدر: ئەرێ تۆ هەقت چییە بەسەرەوە برا؟ ئەچم لەو بەرزاییە سێڵفییەک ئەگرم و ئەگەڕێمەوە.. باشە؟ (( جێی ئەهێڵێ و ئەچێتە دوکانەکەوە، هەندێ شت هەڵئەگرێ.. پاش ماوەیەک دێتە دەرەوەو عەلاگەیەکی بەدەستەوەیە))

زاهید: تۆ لەوە ئەچێ بەرەو شوێنێک بچی وا دەست و دیاریی ئەکرێت.

(( خدر وەڵامی ناداتەوەو بەرەو سەیارەکە ئەچێت و سەرئەکەوێ، زاهید بە ڕاکردن ئەگاتە سەری ))

زاهید: برا من ئەچم بۆ ئەو دێیانە هەندێ قەل و مریشک ئەکڕم.. خوا کارت ڕازبێنێ، بەڵکو بمگەیەنیتە دێیەک.

خدر: ئەی بۆ پێکەوە دانەبەزین، بیانکڕین و دواییش بچینەوە شار شەریک بین؟ هههه

(( دەرگا دائەخات و ئەگەڕێتەوەو بۆ جادە گڵەکە ئەچێ ))

Cut

دیمەنی – ١١٠٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە – ژووری نارەوەن:

(( نارەوەن دانیشتووەو هاوکار چای بۆ ئەهێنێ ))

نارەوەن(( سەرهەڵنابڕێ گۆڤارێک ئەخوێنێتەوە )): دەستخۆش سوپاس.

هاوکار: ئەمەوێ بزانم چای چۆنت پێخۆشە؟

نارەوەن: هەر زۆر نەسوتابێ.. باشە.

هاوکار: بە ئاوی سارد لێی بنێم یان گەرم؟

(( دیدەوان دێتە ژوورەوە ))

نارەوەن: ئەها بە ئاوی سارد لێی ئەنێیت و ئاگرێکی زۆر کزی ئەدەیتێ، ئیتر ئەوە لای من خۆشترینە.. بەڵام چای زۆر تێمەکە دوایی زۆر خەست ئەبێتەوە ناخورێ، باشە ماڵەکەم؟

دیدەوان: من حەزم لە چای خەستە، تا خەستتریش بێ خۆشترە، بەڵام یەک دڵۆپ ئاوی تێ بکرێ لە پیاڵەکەیا، ئیتر بۆم ناخورێتەوە.

نارەوەن: دوو قۆریمان بۆ لێنێ کوڕم، هەریەکەو قۆری خۆی هەبە.

دیدەوان(( بۆ هاوکار )): دەی تۆ بڕۆ بەدیار چییەوە وەستاوی؟

هاوکار: چات بۆ بێنم؟

دیدەوان: نا.. ناخۆمەوە (( هاوکار ئەڕوات و بۆ نارەوەن )) کچێ تۆ چۆنت پێ خۆشە، منیش هەروا ئەیخۆمەوە نارەوەن گیان.

نارەوەن(( گۆڤارەکە ئەخوێنێتەوە )): ئیتر هەرکەسەو چۆنی پێخۆشە، بەدڵی خۆی بکا.

دیدەوان: ئەوە چی ئەخوێنیتەوە؟ من هاتم هەندێ قسە بکەین.

نارەوەن(( سەرهەڵنابڕێ )): هیچی گرنگ هەیە لەسەر ئیشی ئێرە باسی بکەین؟

دیدەوان: بۆ مەرج هەر ئیشە کچی باش؟ ئەی ئێمە هاوڕێین و ئیتر ئەمە قسەوباسێکەو ڕاگۆڕینەوەیەکەو دەنگ و باسی دنیایە، هەرشتێ بێ باسکرێ.

نارەوەن(( گۆڤارەکە لەپەوڕوو لەسەر مێزەکە دائەنێ)): کاك دیدەوان ڕاستت پێ بڵێم من بە قسە کردن زۆر وەڕس ئەبم، تاقەتی گوێگرتنم هەر زۆر کەمە.. لەگەڵ کەسێکیشا زۆر تێکەڵ نەبم، ئەوە هەر هیچ.. هەرچییەکیش بڵێ تێی ناگەم.

دیدەوان: ئینجا تێکەڵ ئەبین بەساقە، چۆنت بوێ ئاوا دەست بە قسە کردن ئەکەین.

نارەوەن: زۆر ببورە تێکەڵ بوون خۆی دروست ئەبێ، من ئاوا ناتوانم تەرکیزم لەسەر قسەکانت بێ (( گۆڤارەکە هەڵئەگرێتەوە)).

دیدەوان: بەڵام گوێم لێبوو لەگەڵ خدر پەنجا پەنجا قسەشت ئەکردو وەڕسیش نەئەبووی.

نارەوەن(( سەرهەڵنابڕێ)): ئەوە حەمەخدر بوو.

دیدەوان: دەی با لەگەڵ ئێمە بیست بیست بێ و پەنجا پەنجا نەبێ.

نارەوەن: بەیارمەتیت، نابینی ئەخوێنمەوە.. ببورە.

(( دیدەوان شتێکی بەدەستەوەیە بەدەست بە بێزارییەوە ئەیگوشێ و ئەچێتە دەرەوەو نارەوەن گرژ))

Cut

دیمەنی – ١١٠٧ – ڕ/ د – بەردەرگای ئۆفیسی وەکالەت:

(( شەنیا دێتە ژوورەوەو هەر لە دەرگاوە))

شەنیا: هەستە تریفە هەستە..

تریفە: (( دەنگ لە ناوەوە)): بۆ کوێ، تۆ وەرە ژوورەوە.

شەنیا: درەنگمە کاتم زۆر نییە، هاتم بۆ نانی نیوەڕۆ حەزمکرد تۆش لەگەڵما بێی.

تریفە(( دێتە دەرەوەو چاکوچۆنی)): بەخوا ئێستا کاک هەندرێن یاپراخی هێنابوو، وتی لەگەڵما نەخۆی دەمی تێوە نادەم.. زۆر ببورە شەنیا گیان.

شەنیا: کچێ بەشی پاروویەک ماوەتەوە وەرە لەگەڵم!!

تریفە: نەبەخوا شەنیا گیان، هەتا قاپەکەی پێ تەواو نەکردم لێنەگەڕا.. تا (( ئامازەی قورگی ئەکا)) ئێرەم هاتووە.. زۆر ببورە ئیشەڵڵا بۆ جارێکیتر.

شەنیا(( بەدەم ڕۆشتنەوە)): کەواتە بۆ من درەنگە.. بای.

تریفە: باییی!

(( تریفە ئەچێتەوە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٠٨ – ڕ/ د – بەردەرگای کارگەی نیگار:

(( زاهید وەستاوەو ڕەمزی دێتە دەرەوە))

ڕەمزی: چیتکرد؟

زاهید: زۆر ماندوو بووم بەخوا بە نیازی هاتنیش نەبووم، ئێ خۆشت ئەڵێی بە مۆبایل هیچم پێ مەڵێ.

ڕەمزی: ئەرێ هەتیو من نەموت خورشیدو خاوەرم بۆ بخوێنەرەوە، وتم چیتکرد؟

زاهید: ئەوەی تۆ وتت کردم و کەچی خوێڕییە پێی لێناو دەرچوو.. وتی دەست بە ئاو ئەگەیەنم، ئیتر نیوسەعات زیاتریش بە دیاریەوە وەستام و نەگەڕایەوە.. بەخوا تا سەیارەم دەستکەوت پێی بێمەوە، هەر گیانم دەرچوو.

ڕەمزی: باشە، ئێستا بڕۆ ئیسراحەت بکە، شەو وەرە بۆ ماڵەوە. (( ئەچێتە ژوورەوە))

زاهید: بە سەرچاو خواحافیز. (( ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١١٠٩ – ش/ن – ماڵی نیگار:

(( نیگارو زوبێر دانیشتوون))

نیگار: لەسەرەوەیە لە ژوورەکەی خۆی.

زوبێر: ئەمشەو ئەچم بۆ ماڵی ژنەکەیتری، گەر زانیم ئاسایی وەریئەگرن، ئەوا سەرەداوی دەرئەخەم و ئەڵێم شتێکی وام بیستووە، وا بەدوایا ئەگەڕێم.. ئەگەر نا.. ئەوە جارێ لێیئەگەڕێم و هەوڵ ئەدەم سبەی دوو سبەی، تەنها بە ئامۆ بڵێم.

نیگار: ئیتر خۆت چۆنی بەباش ئەزانی ئەوە بکە.

زوبێر: ئەی کە ئەو شێرو ڕێویەت بۆ دەوران هێنایەوە ئاسایی بوو.

نیگار(( پێکەنین)): ئەیوت دایە کوڕو کچی کاک زوبێر مناڵی خۆت نەبن تا ئێستا لێت شاردبینەوەو ئێستا بگەڕێنەوە بۆ لای یەک هههه.

زوبێر: بۆ تۆ چیت پێوت؟

نیگار: لە باسی مناڵەکانی تۆوە.. وتم پێت خۆشە دوو براو خوشکێکت بۆ دروست بوو.. هەر زۆری پێخۆش بوو، ئەیوت ئیتر کەسمان هەیە، زۆر بێکەس بووین دایکە.

زوبێر: ئەوە باشە.. کەی لای ئەوان تەقاندمەوە.. لای ئەمیش خۆم پێی ئەڵێم.. با ئاوا پێشینەیەکی هەبێت.. کتوپڕ نەبێ.

نیگار: ئەم داماوە، بە هەموو قسەیەک دڵخۆش ئەبێ.

زوبێر: بەڵام من وا ئەزانم بە تایبەت بۆ ئامۆ زۆری پێخۆش ئەبێ.. ئەها دوێنێ شەو وتی بۆ یەکەمجارە لەگەڵ کوڕێکا ئاوا بە سەربەستی زۆرم پێ ئەچێ و هیچ ترسێکیشم نەبێ؟!

نیگار: دەی بۆی دەربکەوێ برایەتی، ڕەنگە لە خۆشیا تێکچێ هههه.

زوبێر: تا درەنگی نەکردووە، با بگەمە لای ئەوان.

نیگار: باشە بەساقەوبم، ئیتر بە حیکمەتەکانی خۆت ئیش بکە.

زوبێر: خەمت نەبێ، وەک ڕێوییەکەی زرێبار، تا سوور نەزانم ژێرەوەی ئاوەکە هەمووی بەستوویەتی، بەسەریا نارۆم هههە.

نیگار: دڵنیام دڵنیام.. ئاگات لە خۆت بێ، سووک لێخورە.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١١١٠ – ش/ن – ژوورێکی لادێ لەبەرچرا- ماڵی باوکی حەمەخدر:

(( هەرمێ و خدرو باوکیان))

خدر: زمانی شکاوە؟.. هیچ هیچ ناڵێ؟

هەرمێ: چی لێبکەم؟ هەر بە تەنیا مردم لەم ماڵەیا کاکە.. بەخوا زۆر ناچاریش نەبوومایەو بمزانیایە خۆت دێیتەوە، نەئەهاتم بۆ لات.

خدر: هەمووی چارەسەر ئەکەین باوانەکەم، خەمت نەبێ لەمەولا ئەبێ باش بژین.. ئەم هەفتەیە هەموو شتێکت بۆ ساغ ئەکەمەوە.. ئەگەر غەمگینی مام دەروێش حەزی لە شار بێ، زۆر باشترە ئێوەش بێن.. ئیتر بێخەم ئەبم.

هەرمێ: بۆ بە نیازی چی لە باوە بکەی؟

خدر: ئەیبەمە لای خۆم، خەمی ئەوت نەبێ.

هەرمێ: نا توخوا کاکە پۆلا با هەر لای خۆم بێ.

خدر: نا بەقوربان، ئیتر ئەبێ ئاگام لێتان بێ.. باوەش پێویستیی بە چارەسەرو خزمەتی زۆر هەیە، وا ناکرێ هەرمێلە گیان.

(( باوکیان خەندەو سەرلەقاندنی ڕازیی بوون بە قسەی خدرو بە بێ دەرچوونی دەنگی بە لپسن بەڵێ ئەکا، زۆر باشە زۆر باشە.. خدر دەستی ماچ ئەکا))

خدر: پێت خۆشە بێی؟

باوک(( سەرئەلەقێنێ و خۆشیی دەرئەبڕێ.. بە لپسن: ئا ئا زۆر باشە))

خدر: ژنێکی جوانیشت بۆ ئەهێنم باشە.

باوک: (( گرژ ئەبێ و بە دەستی ناڕازیی بوون دەرئەبڕێ.. ئەڵێ ژنم ناوێ نا))

هەرمێ: ژنی ناوێ کاکە.. هەر سەردانی دکتۆری پێ بکرێ بەسیەتی، ئازاری تریشی زۆرە، کە دەستی بۆ ئەبا تێی ئەگەم.

خدر: خەمت نەبێ باوەگیان ئەتکەمەوە بە گوێزی ساغ.

هەرمێ: منیش پێی ئەڵێم بزانم ڕای چییە بێینە شارەوە؟ ئەی ئیش؟ بۆ ئیش چی بکا؟

خدر(( بە سووکیی ئەکێشێ بە پشتی سەریا)): یەعنی من لەو نازو نیعمەتەیا بم، ئێوە پەکی ژیان و ئیشتان ئەکەوێ؟ هەمووی لەسەر من هەرمێلە گیان، وەک پاشا ئەتانژیەنم.

هەرمێ: خوا تۆم لێنەسێنێ هەر بمێنی.

(( خدر سەری ئەنێ بە سنگیەوە))

خدر: ئەگەر ئەوان بەیانی بێن لە دوو بەیانی باشترە.. بۆئەوەی خێرا بتگوازێتەوە.

هەرمێ(( شەرم)): کاکە بۆڵا لێرە پێی ناڵێن گواستنەوە، پێی ئەڵێن شایی ئەکەین.

خدر: دەی با خێرا شایی و دەهۆڵ و زوڕناکەش بکەن و ئیتر پێکەوە بڕۆینەوە.. بزانە چ شاییەکت بۆ ئەکەم، ئەیبینی.

هەرمێ: با پێیان بڵێم.. خۆ کەسی وامان لێرە نەماوە.. وەڵا من هەر زۆر زۆر حەز ئەکەم.

Cut

دیمەنی – ١١١١ –ڕ/د - بەرچایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەحەو کارەی برازای خدر وەستاون))

هاوڕێ: ئەحە گیان خۆت ئەزانی ئەوانیتر ئیشەکەیان حەماڵیی نییە، چەند جارێکیش ئەو دوکاندارانە پێیان وتووم کەسی باشیان بۆ بدۆزمەوە، ئیشەکە لە خۆتان مەکەن ڕۆڵە، با کەسیتر نەهێنین، شوێنەکەی ست ئەردەڵان باش پڕ بکەنەوە.

کاروان: وەڵاهی لە بەیانییەوە تا ئێوارە بووین بە فرفرۆکە، لەوە زیاتریش ناکرێ.

ئەحە: ئێمەت بینیوە دانیشین؟ بێین وەک مامە خدرو کاک ئەردەڵان چایەک بخۆینەوە؟ بەخوا جاری وا هەیە ئێوارە بیرمان ئەکەوێتەوە نانی نیوەڕۆمان نەخواردووە.

هاوڕێ: دەی بەخوا شوێنتان لەق ئەبێ.

کاروان: جا چی بکەین؟ لە دەسەڵاتی ئێمەیا نییە.

هاوڕێ: ئێستا چەند کەسن؟

ئەحە: یانزە.

هاوڕێ: دەی باشە ئەحە تۆ جاروبار ئەو گوزەرەی کۆمپانیاکەی کاک ئاوا بەسەر بکەرەوە، ئەوان گلەییان زۆرترە.. کاروان تۆش ئاگاداری ئێرە بە.. ئەگەر خزم و دۆست و ناسیاویش هەیە، خۆتان دووان بێنن باشترە.

کاروان: با مامە خدر بێتەوە، پێی ئەڵێین.. بزانین کەس هەیە بیهێنێ؟

هاوڕێ: بۆ کاک حەمەخدر لە کوێیە؟

کاروان: چۆتەوە بۆ دێکەی خۆمان.

ئەحە: ئاخر تۆ پێم ئەڵێی گلەیی ئەکەن کاک هاوڕێ.. باوەڕ بکە شەوی پێشین بارێکیان هەبوو، دەمودەست ڕامکردە سەری، خۆ لە گەڕانەوەشدا بووم، بەس وتم با

گلەیی نەکەن.. کەچی ئەو چاو خوارە ناشرینەکەیان و ست ئەردەڵان دەریانکردم نەیانهێشت دایگرم، کەچی ئاوا گلەییش ئەکەن.

هاوڕێ: لە کۆمپانیاکەی کاک ئاوا؟

ئەحە: بەڵێ، باری پیکابێ بوو.

هاوڕێ (( تێفکرین)): ئەها ئاوا!!!! (( ئاسایی بوونەوە)) دەی باشە، پێیان ئەڵێم بزانم ئیتر ئەم خوتە خوت و بۆڵەبۆڵەیان لە چییە؟

ئەحە: ئەرەوەڵا پێیان بڵێ. خۆ درۆ ناکەم؟!

Cut

دیمەنی – ١١١٢ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری زوبێر:

(( زوبێر سەرقاڵی ئیشەو دکتۆرێک بەڕێ ئەکا.. دکتۆرەکە ئەڕواو ئامۆ دێتە ژوورەوە))

زوبێر(( پێکەنین و دەست ڕاوەشاندن)): ها برای کچە تازەکەم بەخێربێیتەوە.

ئامۆ(( دێتە لایەوەو ئەیەوێ دەستی ماچ بکا)): زۆر سوپاس.. ئەی کەی ئەتوانم پێی بڵێم تۆ خوشکمی؟

زوبێر: پەلە مەکە جارێ.. سەردانەکەتی بەلاوە ئاسایی بوو؟

ئامۆ: خۆ ئەو چەتیوە شێتە.

زوبێر (( پێکەنین)): چۆن چی وت؟

ئامۆ: هەر لە ڕێوە وتی هەتیو ئەوە بۆچی بەم بەیانییە هەڵت کوتاوەتە سەرم، ناشێ شەو بیرت لێکردبێتەوەو حەزت لێکردبم.. تۆزێ جنێوی سوعبەتم پێداو وتم هەر کچ نەمێنێ لە دنیایا، زۆر دڵنیابە بیر لە تۆ ناکەمەوە.. کەست بینیوە بیر لە خوشکی خۆی بکاتەوە؟

زوبێر: ئێ ئێ هەی ئافەرین، زۆر باشت پێوتووە.

ئامۆ: ئیتر وتم نا، لێرەوە ڕۆشتم ئیشێکم هەبوو، وتم با سەرێکی خوشکیش بدەم.

زوبێر: هەی ئافەرین گوڵ.. جا هەر کاتێ بەویشم وت.. ئەوسا هەمووتان پێکەوە لەماڵی خۆمان کۆئەبینەوە.

ئامۆ: ئەی بۆ نایخەیتە ئەو کاتەی ئاوا بێتەوە؟

زوبێر: هەر زۆرباشتر، وای لێ ئەکەین.. (( ڤیڤێکسی دکتۆرەکە هەڵئەداتەوە کە پێشتر جێی هێشت)) ئا ئامۆ تۆ وەرە ئێرەوە، ئەو دکتۆرەی چووە دەرەوە، کێشەیەکی باسکرد.

ئامۆ: یا ئەڵڵا خێر کێشەی چی؟

Cut

دیمەنی – ١١١٣ – ڕ/ د – کۆمەڵە داری سەرڕێگای لادێ:

(( هەرمێ و غەمگین وەستاون، غەمگین تەمەن نزیکەی ٣٠ساڵ، قیت و قۆز))

غەمگین: دەی ئەوە زۆر باشە  هەرمێ گیان.. بەس ئەبێ ئەمشەو لەگەڵ باوکم و ئەوانیش قسەیەک بکەم، کێ ئەڵێ پێی خۆش ئەبێ؟

هەرمێ: من زۆرم پێخۆش ئەبێ غەمگین، تۆش هەوڵێکیان لەگەڵا بدە.

غەمگین: چۆن؟ هەر زۆریش هەوڵەدەم، منیش حەزم لێیە، کە ئیش هەبێ و پەکمان نەکەوێ بۆ باش نییە؟

هەرمێ: دە من ئەڕۆمەوە، با فریای شتێک بکەوم بۆ نیوەڕۆ.

غەمگین: باشە بەساقەی تۆ بم.. ئاگاداری خۆت بە.. دوو بەیانی شاییەکە ئەکەین، ئەوە باوکی هەموویەتی.

هەرمێ(( بەدەم ڕۆشتنەوە)): دە باشە ئیتر هەر دڵت لای شاییەکەیە.

(( ڕۆشتنی هەرمێ بە پەلەو غەمگین لەدواوە دیقەتی ئەدا))

Cut

دیمەنی – ١١١٤ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین))

سەرکۆ: وایە.. لە کاتێکی باشا نەڕۆشت.. بەڵام پەکی نەخستووین، سەرچاوەکانی زۆر وریان.. هەموو جوڵەی ڕەوەزی پێڕاگەیاندین.. ئێمە چاودێریی ئەکەین جارێ.. ئەویش وا هەفتەکەی نزیک بۆتەوە لەتەواو بوون، دوو سبەی ئەگەڕێتەوە.. هەموو شتێک ڕوون ئەبێتەوە.

کۆژین: من خدرم لە شوێنێک بینی، هەژا بوو.. بە ڕەنگ و ڕوخسارییەوە خەمۆکیی دیاربوو.. هەستمکرد ئەگەر مەرەخەسی نەکەین ڕەنگە خراپ بشکێتەوەو باری دەروونیی و تەندروستی خراپ بشێوێ.

سەرکۆ: خۆ هەر ئەڵێی لە ئاسمانەوە دابەزیوە، جارێک باسی کەسوکارمان لێنەبیست.. باش بوو پشووەکەی وەرگرت.. بەسوود ئەبێت.

کۆژین: ئەی هەواڵی ناوچەی جێنەڕاڵ؟ هەموو شتێ باش ئەڕوا؟

سەرکۆ: هەر ئەو پیرەمێردە کەمێک ژنەکەی وەڕس کردووە.. ئەمڕۆ نارەوەن پێی وتووە کۆمپانیاکە جێئەهێڵم بێدەنگ نەبیت هههههە!

کۆژین: ئەوە پیرەمێردی ئاخر شەڕە.. ئەبێ دەوری چی بێ؟ بازرگانیی ئاساییە؟ یان ئەوانیش بەنیازی هەرامەکەن؟

سەرکۆ: تا ئێستا هیچ ئامارەیەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ نییە.. ئەو ژنەی لێیە، شتێک ڕووبدا زوو ئاگادار ئەبین.

Cut

دیمەنی – ١١١٥ – ڕ/ د – ناو دێ:

(( دیمەنی شاییەکەی غەمگین و هەرمێ))

Cut

دیمەنی – ١١١٦ – ڕ/د – قاوەخانە:

(( زوبێرو ئامۆو نیگارو دەوران))

دەوران: فەقیر نیم باوە.. ماوەیەکە بە تۆو دایکم چیرۆکم بۆ ئەگێڕنەوە.. جا هەمووشی دەرئەکەوێ فلان و فیسار خوشک و برا دەرئەچن و ئەو باوکەیتر ژنیتری هێناوەو منالی هەیەو کورە چوزانم، من کەی تاقەتی ئەو حەکایەتانەم هەیە.. هەرچییەک هەیە ڕاست و ڕەوان پێم بلێن، با کاردانەوەکە لە خۆمەوە بێ باشترە.. ئا.. هەموو شتێکیش چاوەڕوانکراوە لای من.. ڕۆژگارێکی پڕ سوپرایزە هههە.

زوبێر: ڕۆلە من پرسیاری چیرۆکەکەم لێکردی، ئێستا لە ئامۆ بپرسم چۆن بوو ڕای خۆی ئەلێ.

دەوران: سەیرئەبێ تۆش ببی بە ڕۆماننووس؟

زوبێر: بۆ نا؟ خۆ خراپ ناکەم؟

دەوران: ڕاستت بوێ چیرۆکەکانت زۆریان خۆش ئەوێی.. ناتوانن قولانجێ ئەها (( ئامارژەی قولانج ئەکا)) ئا ئەوەندە لەخۆت دوور بکەونەوە.. چەند گوناحن، ناتوانن ناو خەلک ببینن.

زوبێر: سوپاس بۆ هەلسەنگاندنەکەت هەی هەی کچە تازەکەم (( بەسوعبەتەوە گرژ))

دەوران(( قاقا لێئەدا)): گالتەم کرد، زۆر جوانن.

زوبێر: کەواتە ڕات لەسەر ئەم چیرۆکەی دووایی چی بوو؟

دەوران: نەتێیگەیشتم و نە لەبیریشم ماوە هههههە.

(( پێکەنینی هەموو))

زوبێر: من مەغزای چیرۆکەکەت بە ڕوونیی پێ بلێم؟

نیگار(( ترس)): زوبێر نەکەی.

زوبێر: ئەو ئامۆیەی تەنیشتت ئەبینی؟

دەوران: ئەی چۆن ئەوە ئامۆ گیانە (( دەست بە باڵیا یا سەریا ئەهێنێ))

زوبێر: دەی ئەوە براگەورەی تۆیە.

دەوران: نەموت چیرۆکەکانت لاوازن.. هەر دەمێکە وەک برای گەورەم سەیری ئەکەم.. پیییییف لەم چیرۆکە؟!

زوبێر(( جدییات)): نەخێر، هەردووکتان لە یەک باوکن و دایکتان جیاوازە.

# (( ئەڵقەی پەنجاو چوار))

دەوران(( کەمێک حەپەسان)): ئەرێ ئامۆ چیرۆکنوسین بە پیریی زەحمەتترە یان بە گەنجێتیی؟ با منیش دەست پێبکەم.

ئامۆ: ئەو قسەیەی کاک زوبێر ڕاستە.. تۆ خوشکی ڕاستەقینەی منیت و لە یەک باوکین.

دەوران((بە خۆشییەوە وەک توشبوونی بە هستریا ئەقیژێنێ واوووو هەرچوار پەنجەی هەردوو دەستی ئەگرێ بە ڕوومەتییەوە)): توخوا بەڕاست؟

Cut

دیمەنی – ١١١٧ – ڕ/ د - کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا لەجێی خۆی دانیشتووە، ڕەوەز ئەوراقێکی زۆری لەبەردەستا داناوەو چاوەڕوانی بینین و ئیمزایەتی))

ئاوا: ئەو هەموو ئیشە زۆرەکە کە کراوە.. ئافەرین ڕەوەز، کەواتە من هەر لێرە نەبم باشترە هەهە.

ڕەوەز(( بێخەندە)): دواپەڕەش داهاتەکەیەتی.

ئاوا(( هەڵیئەداتەوە بۆ دواپەڕە، دوای خوێندنەوە)): واو ئەو هەمووە.. قەت ئەوەندە ئیش نەکراوە لەم کۆمپانیایەدا.. پێ ئەچێ زۆر پێت لێ داگرتبن.

ڕەوەز: نا.

ئاوا: ئافەرین دەستت خۆش بێ ڕەوەز گیان، جێی متمانەمی.

ڕەوەز: سوپاس.

ئاوا(( بەلاچاوێک سەر بەرز ئەکاتەوە، وەک پێسەیر بوون)): دیارە ئەم ماوەیە لێرە نەبووم هەر خۆت بووی بێدەنگتریش بووی.

ڕەوەز: ڕاستە.

ئاوا: داهاتەکە لەکوێیە؟

(( ڕەوەز بە پەنجە ئاماژەی قاصەکەی بۆ ئەکاو ئاوا بە خەندەیەکەوە چاوی بۆ هەڵئەبڕێ))

Cut

دیمەنی – ١١١٨ – ڕ/ن –ماڵی خدر:

(( خدرو نارەوەن و تریفەو هەرمێ و غەمگین، باوکی خدر لەسەر سیسەمەکە نوستووە.. ئەمان لە عادەتیی سوکتر قسە ئەکەن.))

نارەوەن: ئیتر خوا کە بیدا ئاوایە، بە یەک ڕۆژ هەردوو کوڕەکەم گەڕانەوە، دەک لە خوا بەزیاد بێ.

خدر: خوا تۆمان بۆ بهێڵێ.

هەرمێ: ئیتر ئەبی بە دایکی منیش، بەخوا هەر پێت ئەڵێم دایکە، لەوە بترازێ هیچ ناڵێم.

نارەوەن: ئەی دایکی تۆو کاکە غەمگینیشم بەساقەوبم.

غەمگین: دەستت ماچ ئەکەم، خوا بۆ ئێمەت بهێڵێ.

خدر: هەڵشۆو گروپەکەی گەیشتنە کوێ تریفە؟

تریفە: سەرەڕۆکە لە سێدارە ئەدرێ لەگەڵ دووسێیەکیترداو ئەوانیتریش ئەڵێن تاهەتایی حوکم دراون.. ئەڵێن ئەبێ تەمیزو مەرسومەکەی بێتەوە، ئەوسا جێبەجێ ئەکرێ.

خدر: بەداخەوە.

نارەوەن: داخی بۆچییە؟ ئەوە دارەوانە خوێنڕێژەکە بوو، ئەو تفی کردبووە ناودەمی.

تریفە: هەقم نییە بەسەریەوە.. تەلاقی خۆمم وەرگرتووەو ئیتر چی لێدێت جار بە جەهەنەم.. کاک حەمەخدر دەستم لە مارەیی و هەموو شتێکی خۆشم هەڵگرت، تەنها پارە دزراوەکەم بۆ بگەڕێتەوە.

خدر: خانووەکەش بە ناوی خۆتەوەیە.

تریفە: بەڵێ بەڵێ.

نارەوەن: ئەم ئێوارەیە بڕیارە لە ماڵی کاک زوبێر کۆببینەوە تەلەفونی کردو وتی هەر ئەبێ بێن، چەند وتم کاکە گیان،کاکە ئاواو کاکە حەمەخدرو خوشکی هاتوون، سوێندی خوارد کە ئەبێ ئێوەش بێن.

خدر: بۆ؟ بۆنەکە چییە؟

نارەوەن(( پێکەنین)): جا بۆنەی چی نییە، دەرکەوت ژنم بەسەرا هاتووەو کچێکی لەویش هەیەو کورە هەرمەپرسە ئەو ناپیاوە چ ڕێوییەک بوو هههە.

خدر: ئۆووووو ئەوە بەڕاستتە؟

تریفە: ئەرەوەڵا خوشکێکیتریشمان بۆ پەیا بوو، خوا نەیبڕێ.

خدر: تۆ گوێی نەدەیتێ نارەخان ها !!!!!!!!!

نارەوەن: لەوەولاترچێ گوێ بدەمە چ شتێکی؟ ئەو باوک و برای کوشتووم گوێم نەداوەتێ، ئێستا خەم لەوە بخۆم؟

خدر: تریفە ئەوە ئەم خوشکەش خوا ناردی، بە جارێ دوو خوشکت بۆ پەیابوو.

تریفە: ئەرەوەڵا لەوەتەی بینیومە وەکو خوشکم سەیری ئەکەم و قەت لە خۆمی دانابڕم.. ئەوە ئەڵێم جارێ لەڕێوە هاتووە، ئەگینا ئەیبینی بۆت ئەکەم بە چ بوکێک.

خدر: قوربانی تۆ.

نارەوەن: خەمی ئەوانت نەبێ لەسەر چاوی ئێمەن.

خدر.. چاوتان خۆش بێ.. ئەوە ناگەڕێیتەوە بۆ لای دیدە هههەه؟

نارەوەن: دەک خوا چۆن لە ناوی دەمی دارەوانیدا.. ئاوا لەناو دەمی ئەمیش با.. باوەڕ ئەکەی هەمان قسەکەی دارەوانی کردەوە کە سەرەتا هەڵی خەڵەتاندم و لێم نزیک بۆوە؟ ئەڵێ دیدەوان و نارەوەن دوو ناوی زۆر لەیەکەوە نزیکن.. زۆر پێت مورتاحم.. هەرشێت بووم شێت!

________________ Cut ________________

دیمەنی – ١١١٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی لە ژوورەکەدان))

ڕەمزی: تۆش بچۆ.

شەنیا: من بۆ کوێ بچم کاک ڕەمزی؟ هەر یەکدوویەکیان ئەناسم.

ڕەمزی: ئەی ئەو بۆنانە باش نییە بۆ نزیک بوونەوە لە ئامۆ؟ دەوران هاوڕێی گیانی بەگیانیتەو با لەگەڵ خۆی بتبا.

شەنیا: خۆم خەریکە ئەتەقم برای دەوران دەرچوو.. ئێستا من بچم ئەو هەتیوە سەگە هەڵئەسێ و ئەڕوا.. بێزار بووم لە خۆ بچووککردنەوەو کابرا منی ناوێ.. هەرچییەکی بۆ بکەم، هەر نایەوێم.

ڕەمزی: کار بگاتە جنێوپێدانی زۆر ڕەشبینییە.

شەنیا: نەک هەر ڕەشبینیی، هەر حەز ناکەم بشیبینم، هەر خۆی نا دەورانیش.. بە ڕاستی سوکایەتی زۆری پێکردم.. لە توانامانەما.. ئەتوانم ئیتر بکشێمەوە؟

ڕەمزی: شەنە گیان خۆت ئاقڵی و ئەزانی ئەم جۆرە گروپانە دەستبەرداری کەس نابن.. بۆ نمونە ئەوە بەسەرۆک بڵێم، هەر شێتگیر ئەبێ، یەکسەر دەستی ئەچێتە خوێنت.. من خۆشم ئەوێی حەز ناکەم توشی بەڵا بیت باوانم، لەبەرخۆت ئەڵێم لە مێشکی خۆتی دەربێنە.

شەنیا: ئەی خۆت نەتوت هەر ئەم ئیشە ئاسانەیەو هیچیتر؟

ڕەمزی: ئەی گوڵەکەم تۆ بیرت چوو ئەو ئیشەت دەمێکە نەماوەو تۆ ژمێریاری دووەمی گروپیت؟

شەنیا: ئەی بۆ هەر بەدوای تریفەوە بووم و نەتوت بوەستە؟

ڕەمزی: ئەوە ژیانی تایبەتی خۆتەو ئامۆت خۆش ئەوێ چیت لێ بکەم؟ ناتوانم دەست بهێنمە ڕێت.

شەنیا(( تورِە)): نەفرەت لە ئامۆو لەو ڕۆژە ڕەشەشی بەهۆی ئەوەوە توشی بووم.

ڕەمزی(( زۆر هێمن)): چاوەکەم لەم گروپەی ئێمەدا دەنگ بەرز کردنەوەی تیا نییە، تەنانەت سەرۆکیش دەنگ بەرز ناکاتەوە.

شەنیا(( دەنگی بەرز)): نەفرەت لە گروپیش.

ڕەمزی(( زۆر بە توندی زللەیەکی لێ ئەداو بە هێمنیی ئەدوێ)): ئەوە بۆ وا دەنگ بەرز ئەکەیتەوە گوڵەکەم.. خۆ من بە گاڵتە قسەم بۆ نەکردی.. تازە ژیانت پابەندە بەم گروپەوەو لە خۆت زیاتر چاودێریی کراوی، نەک خوانەخواست بکەویتە هەڵەیەکەوە.. کەواتە ئەبێ هەموو بڕیاری ئێمە بخەیتە پێش هەڵسوکەوتی ڕۆژانەشتەوە.. قسەکەم تەواوە؟

شەنیا(( دەستی بە ڕوومەتیەوەو سەری داخستووە)): بەڵێ فەرمانی جەنابتە.

ڕەمزی: جا ئەم هەفتەیەی دێتەوە پڕ ئیش ئەبین.. پلانی ئیشێکی وام بۆ داناوی، گەر پێتکرا، دەسکەوتێکی زۆر باشت ئەبێت و ڕەزامەندیی سەرۆکیش وەرئەگرمەوە بۆ پێدانەوەی هەموو پارەکانی باوکت. تازە پانزەساڵی داهاتوو ئەو نابینینەوە.. ئەو پارانەش بۆ تۆ سوودی زۆرەو خۆتی پێ بنیاد ئەنێی.

شەنیا: هەرچی بڵێی وا ئەکەم، سەرچاو.

Cut

دیمەنی – ١١٢٠ – ڕ/ د – دوکانی شیرینیی ئەردەڵان:

(( گوڵزار بنێشت جوین و نازو ئەردەڵان وەستاون))

ئەردەڵان: پارەی چیم ئەدەیتێ ڕوحەکەم، من خۆشم ئەکەم بە قوربانت.

گوڵزار: ئەردەڵان گیان دەست لە من هەڵگرەو وازم لێبێنە لە ڕای خوا.. تۆ گەدوگیپاڵی خۆت بینیوە کاکە؟ ئەزانی ژیانی من و تۆ چەند جیاوازە؟

ئەردەڵان: ئەی بۆ هاتووی لای من شیرینیی ئەبەی؟ بۆئەوەی هارمکەی؟

گوڵزار: نا .. ئەڵێم مادام کابرا پێی خۆشە بە جوانیی بمبینێ، ئەمڕۆ مای نەیڵ و ئایلاشم داناوەو شەدۆی جوانم کردووە، وتم با کەمێک دڵ و دەروونی بگەشێتەوە.. ئەگەر حەز ناکەی ئیتر نایەم.

ئەردەڵان: با، توخوا هەموو ڕۆژێ وەرە.. ئەو شتانە دابنێیت و دانەنێی خۆت هەر جوانی، بەساقەی یەک تاڵ لە قژەکەت بم.

گوڵزار: کەواتە برۆ دوو کیلۆی زۆر جوانم بۆدانێ.. بۆ ئەوەی مورتاحیش بیت، قەینا پارە نادەم.

ئەردەڵان: بەس تۆ ئەمرکەو ئیتر هەقت نەبێ، بزانە چیت بۆ دائەنێم؟

گوڵزار: زمانیشت زۆر شیرینە.

ئەردەڵان: پارچەیەک لەویشی لەگەڵا بکێشم.

(( تریقەی پێکەنینی گوڵزار))

Cut

دیمەنی – ١١٢١ – ڕ- ئێوارە – حەوشەی ماڵی نارەوەن:

((دەوران بە ڕاکردن بەرەو ژوورەوە ئەچێت و لەبەر مدخەلەکەیا ئەوەستێ.. ئامۆش دێتە حەوشەکەوە))

دەوران(( بە دەنگی بەرز)): نەهاتن؟؟؟ چاوەڕێی ئێوەین؟

تریفە(( دێتە دەرەوەو دەوران ماچی ئەکا)): وا دایکم و تیرۆژیش هاتن.

دەوران: دەی خێراکەن توخوا درەنگە.. ئەی ئاوا؟

نارەوەن(( دێتە دەرەوەو لەگەڵ دەوران یەکتر ماچ ئەکەن)): ئەچینە لای ماڵی ئەوانیش و با بەدوامانا بێن.

تیرۆژ(( دێتە دەرەوەو دەوران ماچی ئەکاو ئەویش)): دایکە وەرە دایخە.

نارەوەن: وا هاتم وا هاتم ئەم شڕ شێتە هەر بیری بردمەوە.

(( بە پێکەنین و خێرایی هەموو بەرەو دەرگای دەرەوە ئەچن))

Cut

دیمەنی – ١١٢٢ – ڕ- ئێوارە – بەردەرگای ماڵی شەنیا:

Mute

(( شەنیا دەست بە ڕوومەتیا ئەهێنێ و زۆر بە خاویی بەرەو ماڵەوە ئەچێتەوە.. قژی هاتۆتە ناوچاوی، دواتر کە سەر بەرز ئەکاتەوە، ناوچاوی پڕە لە فرمێسک.. فرمێسک ئەسڕێت و قژی چاک ئەکات و ئەچێ سەیارەکەی دەرئەکات و دەرئەچێ))

Cut

دیمەنی – ١١٢٣ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

{{ دیمەنێکی سەربەست.. دیالۆگەکان کار لە ڕەوتی ڕووداو ناکەن.. چاو نیسکافە خواردنەوە.. یان میوە دانراوە}}

(( نیگارو نارەوەن پێکەوە دانیشتوون و پێئەکەنن، ئامۆو دەوران و تیرۆژ پێکەوە.. خدرو غەمگین و زوبێرو بروسک و ڕێژوان و ئاواو نینا پێکەوە.. سەلواو هەرمێ و چیمەن و تریفە پێکەوە، خدرو تریفە کەمێک چاوبازیی..))

{{دیالۆگ ڕۆژانەو باسی ئاسایی خۆیان، باسی یەکتر ناسینەوە ناکرێت، دەستخۆشیی لە سەلواو چیمەن بۆ خواردنەکەیان.. جاروباریش دەوران دەستێ ئەکێشێ بە ئامۆدا}}

Cut

دیمەنی – ١١٢٤ – ش/ د – باخی چێشتخانەیەک:

(( سەرچڵ و دڵنیا نانخواردنیان تەواو کردووە، چایان بۆ دێت))

دڵنیا: ئاخر چۆن لە خۆمەوە قسەی تیا بکەم؟.. با ئیشێک هی خۆم بێ بزانە چۆن ئەیکەم؟

سەرچڵ: نا چاوەکەم، خراپ حاڵیی بوویت.. ئیشەکە ڕێک هی خۆتە.. پارەیەکی باش بەوە وەرئەگرین، ئەوان داوایانکرد کچێک ئەوەیان بۆ بکات، منیش وتم جا ئەوە چییە؟ بە خۆشەویستەکەی خۆم ئەڵێم.. ئەگەر حەزیشت لێی نییە ئێستا تەلەفون بۆ کچێکی خزمم ئەکەم، ئەو بیکا.

دڵنیا: یەعنی پیاوێک لەگەڵ کچێکا وەستاوە، کە قیژاندی وتی دەستم بۆ ئەهێنێ، بە هەردووکمان لە کابرا بدەین و خەڵکی لەسەر کۆکەینەوە؟

سەرچڵ: ڕێک هەرئەوەندە.. کە خەڵکەکەش کۆبۆوە تۆ بڕۆ.

دڵنیا: ئەی ئەگەر کابرا دەستی بۆ نەبرد؟

سەرچڵ: تۆ پەیوەندیت نەبێ بە کابراو کچەکەوە، هەر کە قیژاندی ئیتر پڕی بدەرێ و لەگەڵ ئەوا تۆش لێیدە.. ناهێڵن بگاتە پۆلیس، ئەگەر پۆلیسێک یا مەفرەزەیەکیش لەوناوە بوو، چی تیایە؟ بڵێ بەڵێ بەچاوی خۆم بینیم دەستی بۆ برد.

دڵنیا: جا ئەوە سوودی چییە بۆ ئەوانەی پێیان وتووی؟

سەرچڵ: پاککردنەوەی حسابی نێوان خۆیانە، منیش نازانم.. پارەکەیت بەدڵە؟

دڵنیا (( پێکەنین)): بۆ نا؟ هههە وردە ئیشە با هەبێ.

Cut

دیمەنی – ١١٢٥ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان و ڕەمزی و ڕەوەز))

ڕەوەز: وا نەبێ ناتوانم دەریکەم، زۆر لە پڕا هاتەوەو هەموو کلیل و داروبەردی لێوەرگرتمەوە.

ڕەمزی: باش شاردووتەوە؟ مەبەستم ناتوانێ بیگاتێ؟

ڕەوەز: نا خەمی ئەوەت نەبێ.

دیدەوان: وریابن شەنیا بەوە نەزانێ.

ڕەمزی: نا.. خۆم دوورم خستۆتەوە.. جارێ ژاروژەنگی ئەو زللەیەی لە دڵایە، کە بۆم باسکردن.. بە ڕۆژ لە کارگە هێشتوومەتەوەو ناهێڵم بۆ نانیش بچێتە دەرەوە.

ڕەوەز: بەڵام کاک دیدەوان تا ئێستاش باوەڕ ناکەم خدر بەوە تێبکەوێ؟

دیدەوان: وەک پێموتن.. هەر ئیشێک ئەکەی، یەکیان با هی ئەوکاتە بێ و ئەویتریشیان بۆ داهاتوو.. جا ئەوی خدر، ئاسانە، ئەمە دووەمین هەنگاوە بۆی ئەنرێ.

ڕەمزی: بەڵام یەکەمیان سوودی نەبوو هیچ!

دیدەوان: ناساندنی گەمەکە وا ئاسان نییە.. جارێ کاتی ناسینی دەموچاوەکانە.. ئێوە لێیگەڕێن بۆ خۆم.. با پلانەکە وەک خۆی بڕوا.

ڕەمزی: بۆ خدرو ئاوا پێکەوە.

دیدەوان: نا وا نییە.. جارێ تێی ناگەی.

ڕەوەز: ئەزانم.. بەنج کردنی ئاوا بە پلانەکەو هێنانی خدر بەو بیانووەوەو دەرکردنی کارتۆنەکان.

دیدەوان: ئەوەی وتم با وەکو خۆی بڕوا، هەموو شتێک ڕوون ئەبێتەوە.. ئەوەندەی نەماوە، تێئەگەن.

Cut

دیمەنی – ١١٢٦ – ش/ د – باخی ماڵی ئاکۆ:

(( نینا بە ڕاکواری جلوبەرگی دیمەنی – ١١٢٣ – ەوە، لە ماڵی گێلاسە))

نینا: هەر مەپرسە! دایکەو کچە یەک لەیەک دڵپاکترو سافتر.

گێلاس: ئەی ئەمان، ئەمان هیچ گرژو تاڵ نەبوون؟

نینا: ناوەڵا پورە گێلاس، جارێ نارەوەن خانەکەی من و ژنەکەیتر، ڕێک ئەتوت دوو خوشکن.

ئاکۆ: ئێ خۆ مێردیان نەماوە تا شەڕی لەسەر بکەن؟ هههە ئیتر بۆ ڕێک نابن؟

گێلاس: دەوڵەمەند دیارن؟

نینا: بە جلوبەرگ و سەیارەیا دەوڵەمەند دیارن.. هەردووکیان سەیارەیان هێنابوو.. کچەکەیان هەموویانی دەعوەتکرد بۆ پارک و شاری یاریی و هەندێکیان لەگەڵ ئەو سەرکەوتن، دایکەکەش سەیارەی خۆی پێ بوو بڕواتەوە.

ئاکۆ: با ئێوەش بچوونایە!

نینا: ئەوەندەم یاریکردووەو پیاسەم کردووە لەو میسرە، هەر شەل و کوت بووم، جا هی ئەوێ و ئێرە ئەکەی بەیەک؟ باش بوو ئاواش ماندووی سەفەر بوو، داوای لێبوردنی کردو وتی ناتوانین.. ئەو کاک حەمەخدرەکەش خۆی و خوشک و زاواکەی نەچوون.

گێلاس: ئەرێ ئەو کەچەڵە چییە بووە بە مووی بەرلووت؟.. هەر ناوێری سەرێکی ماڵیان بدەی لەوێ قوت بۆتەوە.

ئاکۆ: ژنەکە شەریکن شەریک.

نینا: بەخوا پیاوێکی زۆر باش دیارە.

گێلاس: هەر لەو پیاوە باش دیارانە بترسە، کاک دارەوانیش باش دیار بوو.

Cut

دیمەنی – ١١٢٧ – ڕ/ د - بەردوکانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان لەبەر دوکانەکەی وەستاوەو گوڵزار دێت.. دڵنیا وەک چاوەڕوانی تەکسی یان پاس بکات))

ئەردەڵان: ئەوە هاتی گوڵی گوڵان؟

گوڵزار: ئەی چۆن نایەم براکەم؟ (( دڵنیا دیقەتیان ئەدا)) ئەگەر هەڵە نەکەی هەموو ڕۆژێک دێم پاقلاوەیەک ئەخۆم و ئەڕۆم.

ئەردەڵان: بۆ نەچینە ژوورەوە پاقلاوەکەت بە ئیسراحەت بخۆی؟

گوڵزار(( ئەقیژێنێ)): ئەی هاوار خەڵکینە فریامکەون، ئەم پیاوە بە نیازی دەستدرێژیی کردنە.. دڵنیا دێت و بە هەردووکیان بە جانتاکانی دەستیان و بە زللە لێی ئەدەن))

(( دوو سێ کەس کۆئەبنەوەو یەکێکیان لێی ئەداو ئەردەڵان هاوار ئەکاو سوێند ئەخوا هیچی نەکردووە.. ڕەوەز دێت و خەڵکەکەو دڵنیای لێ دوور ئەخاتەوە))

ڕەوەز(( تورە)): بڕۆن کاکە ئێوە بڕۆن هیچ نییە خوشکی منە.. ئا وەرن پێشمکەون بۆ کۆمپانیا.. ئەمە چییە دنیاتان هێناوەتە سەر خۆتان؟ پێشمکەون دەی!

ئەردەڵان: بە قەبری باوکم کاکە ڕەوەز هیچم نەکردوە بەخوا، لە خۆیەوە قیژاندی.

دڵنیا(( هەر وەستاوە)): خوا ڕووت ڕەشکا، خۆم ئاگام لێ بوو.

ڕەوەز: باشە دایکەکەم سوپاس، تۆش بڕۆ تکایە.

ئەردەڵان: وەڵڵاهی هەردووکیان درۆ ئەکەن.

ڕەوەز: بێدەنگبە با خەڵکی زیاتر کۆنەبێتەوە، دەمت داخەو بەس.. هیچت لێ ناکەم.

ئەردەڵان: ئاخر گوێم لێ ئەگریت؟

ڕەوەز: ئا ئا لەوێ گوێتان لێ ئەگرم، ئێستا چەنە مەدەو هیچیتر.

دیمەنی – ١١٢٨ – ڕ / ن – نەخۆشخانەی زوبێر:

(( زوبێر، تەلەفون دائەخاتەوەو خدرو ئامۆ))

زوبێر: ئەڵێ با بیهێنێ، پزیشکی پسپۆڕمان لایەو نەشتەرگەریشی پێویست بێ بۆی ئەکەین، تازەترین ئامێری کارەبایی و هەر زۆر شتی وت، هەمووی لێیە.

خدر: زۆر سوپاس، کاکە زوبێر گیان کاکە ئامۆ.. شەرمندەتان کردم.. بە ڕاستی ئەمەوێ چارەسەر بکرێ، هەست ئەکەم کەمتەرخەمیم بەرامبەری کردووە.. بەوە من ئاسوودە ئەکەن.

ئامۆ: هیچ خەمت نەبێ کاک حەمەخدر گیان، باوکی تۆ گەورەی ئێمەیەو هەر ئەبێ چارەسەر بکرێ.. ئامادەییم تیایە خۆم بیبەمە دەرەوە گەر پێویستی کرد.

خدر: قوربانت کاکە ئامۆی گوڵ، زۆر سوپاس.

زوبێر: بابە دەرەوەی چی؟ ئەمە شەلەل و پەککەوتنی دەنگە ژێکانە، دکتۆر نیاز دڵنیای کردمەوە کە زۆرترین ڕێگەی لایە بۆ چارەسەر کردنی.. بەو هیوایەی بە زووترین کات بێتەوە دەنگ و کێشە چییە نەیمێنێ.

خدر: ماڵی ئێوە ئاوا بێ، ئیتر من ئەیدەمە دەست ئێوەوە، دڵنیام باشترین چارەسەری بۆ ئەکرێ.

زوبێر: بە دڵنیایی وا ئەبێت.

(( خدر ئیزن ئەخوازێ کە بچێ باوکی بێنێت و نیشانی دکتۆرەکەی بدات و خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١١٢٩ – ڕ/ د – ناو سەیارەی شەنیا:

**شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

هیچ پەلەم نییە.. ئای غەدری زۆر لە چەندین کەسیتریش کراوەو بە نهێنی تێپەڕیوەو کەس نەیویستووە لاپەڕەکەی هەڵبداتەوە.. بەڵام ئەوە شەنیایە؟ هههههه.. ئای ڕەمزی کە خراپ حاڵیی بوویت، شەنیا وەک میرنیزامی باوکی نییە بە ئارەزووی خۆت هەڵیپەڕێنی.. من پەلەم نییە، بەڵام دڵنیابە، خوێنت بە دەستی کەسێک ئەڕێژم، وەکو ڕاماڵ چاوت بچێتە پشتی سەرت کە ئەو کەسە ئەتکوژێ.. ئەوسا بە کامی دڵ، دێم و لەسەر خوێنی ڕژاوت زۆر شێتانە سەما ئەکەم.. پێت ئەڵێم ڕەمزی! ئەمە وەڵامی زللە بروسکەییەکەت بوو، کە تۆ بێ ئەقڵانە وەشاندت و بۆ منیش ئاگاهێنەرەوە بوو.. با جارێ وا بڕوا تا دەرفەتی خۆی هەڵئەکەوێ، تا سەماکەم، من کۆیلەو تۆ خاوەنکارم بە.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

Cut

دیمەنی – ١١٣٠ – ڕ/ن - کۆمپانیای ئاوا – ژووری ئاوا:

(( گوڵزارو ئاواو ڕەوەزو ئەردەڵان لە ژوورەوەن، دەنگە دەنگە))

ئاوا(( تورە)): چییە ئەم دەنگە دەنگەتان بۆ هێناوەتە ئەم ژوورە؟

ئەردەڵان: توخوا کاک ئەردەڵان فریامکەوە، چەند ساڵە من ئەناسیت، هیچ شتێکی نابەجێت لە من بینیوە؟ ئێستا کاکە ڕەوەز داوای کەفیلم لێ ئەکا.

ڕەوەز: با کەسێک ببێ بە کەفیلی.

ئاوا: ئەوە تۆ عەیب ناکەی ڕەوەز داوای کەفیلی لێ ئەکەی؟ کەفیل لە کوێ بێنێ قوڕ بەسەری داماوە؟

ڕەوەز: حەمەخدر هاوڕێیەتی.

________ گەڕانەوەی هەیە ____________________ Cut ________________

دیمەنی – ١١٣١ – ڕ/ن – ڕاڕەوی کۆمپانیای ئاوا:

(( دوو کەس دوو کارتۆن لە ژووری ڕەوەز دەرئەکەن و ئەیبەنە خوارەوە، لە دەرگاکەوە دەرئەکەون کە ئەڕۆن، کەس نایانبینێت))

Cut

دیمەنی – ١١٣٢ –گەڕانەوەی بۆ دیمەنی – ١١٣٠- کۆمپانیای ئاوا- ژووری ئاوا:

ئاوا(( توڕە)): ڕازیم نییە کەس ناوی کاک حەمە خدر بخاتە بابەتی وا بێبایەخەوە.. بچنە دەرەوەو ژاوەژاو بەسە دەی.

ئەردەڵان: جوابم نارد بۆ کاک حەمەخدر لەوێ نەبوو، ئەو ئەزانێ من چ پیاوێکم.

ئاوا: واز لەو بێنن.. (( بۆ گوڵزار)) تۆ چیت ئەوێ کچێ؟

گوڵزار: جارێکیتر سەرەڕێم لێ نەگرێ و پێم نەڵێ وەرە دوکانەکەوە.

ئاوا: تۆ چ کارەی لەمناوە؟

گوڵزار: هەر بۆ خۆشیی ئەچم شیرینیی لێ ئەکڕم، خۆ ڕێمان لیناگرن ئیشەڵڵا؟!

ئاوا: بڕۆ وەل بە لەبەرچاوم نەتبینمەوە.. خۆت حەزت لەو بەزمە نەبێ ناچیتە دوکانی ئەو.. ئەمجارە بەمجۆرە بتبینمەوە، ئەتدەمە دەست پۆلیسەوە.

گوڵزار: ئهـ ء، بە پۆلیس ئەمترسێنێ.

ئاوا(( توڕە)): بڕۆنە دەرەوە.. ڕەوەز تۆش. کەس لێرە نەمێنێ.

ڕەوەز: بەسەرچاو.

ئاوا(( ئەوان ئەچنە دەرەوە)): تۆ سەیری ئەم کەربازاڕییەکە!!!

Cut

دیمەنی – ١١٣٣ –ڕ/ن –ئۆفیسی نیگار:

(( نیگار دانیشتووە خەریکی داهێنانی قژیەتی و ورتە ورت ئەکا لەبەر خۆیەوە، وەک گۆرانی.. شەنیا دێتە ژوورەوە))

شەنیا(( باوەشی پیا ئەکاو ماچی ئەکا)): ئەک یاخوا هەر لە خۆشیا بن.

نیگار: بەقوربانت ئێوەش هەر دڵخۆش بن یاخوا. (( سوعبەت مۆڕە)) جارێ پێم بڵێ بۆ دواکەوتی؟ ئەوکاتە هاوبەشیی خۆشییەکانم بکە.

شەنیا: ڕاستت ئەوێ شەوێ زۆر دەرەنگ نوستم سەرم ئەیەشا، بە کورتی درەنگ خەبەرم بووەوە.

نیگار: دەی خەوی خێرت بێ.. ڕەمزیش دووجار هەواڵی پرسیت.

شەنیا: ئۆو قوربانی بم، ئەوە بەڵێنم پێدابوو زوو بێم، خەجاڵەت خۆم.

ڕەمزی (( دێتە ژوورەوە)): ئەوە قوربانی من بووی شەنەگوڵ؟

شەنیا: ئەی لە تۆ زیاتر کێم هەیە کاکە ڕەمزی؟ ئەی بۆنخۆشترین گوڵ.

ڕەمزی(( بۆ نیگار بە بزەوە)): بە زمانە لوسەکەی تێنەکەوی نیگارخان.. ئەوە ئێشی دواخستووەو ڕیایی ئەکا.

نیگار: وایە چاکی لێ ئەزانێ، بە دوو قسەی شیرین دواکەوتنەکەی داپۆشی.

شەنیا: نیگار خان ویستم ئەوەم بۆ باسکەی.. دەوران گیان دوو خوشکی تازەی چۆن بۆ پەیا بوو؟.. بەخوا ڕەنگە ئیتر بەساڵیش نەمانبینێ، گوێی نەداتێ.

نیگار: ئێوە پێشتریش خوشک بوون باوانم، چۆن تۆی لەبیر ئەچێ؟ هەروەکو جاران ئەبێ و هیچ ناگۆڕێ.

ڕەمزی(( بۆ شەنیا)): دەی کە قسەت تەواو بوو، وەرە خوارەوە درەنگە، کاتی ئیش زۆر تێپەڕیوە.

نیگار: کەواتە جارێ بچۆ بەلای ئیشەکەتەوە، نەک پەک کەوتبێ.. دوایی لەگەڵ دەورانا هەموو شتێکت بۆ باس ئەکەین.

شەنیا: باوەڕکە من لە ئێوە دڵخۆشترم گیانی گیان.

نیگار: وەی لەو زمانە لوسە، هەرکات ڕەمزی وتی!!

(( چوونە دەرەوەی شەنیا بەدوای ڕەمزیا ))

Cut

دیمەنی – ١١٣٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:
(( تریفە بە خەندەو نازەوە بە مۆبایل قسە ئەکا))
تریفە: ١- خەریکی چیت؟............ ٢- ئۆو یەعنی ئەمڕۆ نایەیت؟ ............... ٣- نەوەڵا هەر ویستم هەرمێ لەگەڵ خۆتا بێنی بازاڕێکی پێ بکەم............ ٤- تۆ بێیتەوە چۆن لێرە نابم ............ ٥- ئاگاتان لە خۆتان بێت، کاتی خۆش و ئیشەڵڵا خوا شفای باوکیشت ئەدا...... ٦- خواحافیزت بێ. (( بزە))

Cut

دیمەنی – ١١٣٥ – ڕ/د – بەرماڵی خدر:
(( خدرو هەرمێ و غەمگین، لەگەڵ باوکی خدران، بە پێێ خۆی ئەڕوا.. ئەیهێننە ناو سەیارەکەی خدرەوە.. خدر تێل ئەکا)) خدر: باوکم ئەبەین بۆ نەخۆشخانەکەی ئامۆ، هەندێ بەڵێنیان پێداوین چارەسەر بکرێ، تەبعەن لەسای سەری کاکە ئامۆوە.......... ٢ – ئەگەر ئەمرێکت هەیە، زوو ئەگەڕێمەوە بۆلات........... ٣- زۆر سوپاس ماڵت ئاوا بێ، قوربانی تۆ بم.. باوەڕ مەکە وا زووو بیپەرژێتە سەر بازاڕکردن.. خۆم دوای نیوەڕۆ دێمەوە ئەگەر لەوێ بیت؟.......... ٥- زۆر سوپاس.. ئازیزیت.......... ٦- قوربانی تۆ، سوپاست ئەکەم.. تۆش ئاگات لەخۆت بێ، کاتی خۆش ........ ٧- خواحافیز.
(( باوکیان ئەخەنە ناو سەیارەکەوەو خدر ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١١٣٦ – ڕ/ د – بەردەرگای کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەوەزو گوڵزارو ئەردەڵان و دوو کەسەکە))

ڕەوەز(( بۆ دووانەکە)): لە سەیارەکەیایە؟

یەکیان: بەڵێ.

ڕەوەز: دە ئێوە بڕۆن. (( ئەوان بە سەیارەکەوە ئەڕۆن)) ئەردەڵان گیان، گوڵزار بە من سپێرراوە باوکەکەم، نابێ وای لەگەڵ بکەیت.

ئەردەڵان: بەخوا هیچم نە.......

ڕەوەز(( قسەی پێ ئەبڕێ)): دەی پێویست ناکا زۆر لەوە زیاتر لەسەری بڕۆین.. داوای لێبوردن لە گوڵزار بکە دەی.

ئەردەڵان: هەرچەندە هیچیشم نەکردووە، قەینا داوای لێبوردن ئەکەم.

گوڵزار: بوراوی گیانەکەم، هیچ نەبووە.

ئەردەڵان: ئەی بۆ حەیات بردم؟ ها؟

گوڵزار: لە نێوان هاوڕێیا ئەگەر هەڵەش هەبێ، لێبوردنیش هەیە.

ڕەوەز: ئێستا بڕۆن، بەڵام ئەردەڵان تۆ بە خدر بڵێ لەبەر خاتری تۆ لێم خۆش بوون.

ئەردەڵان: باشە بەسەرچاو.. هەرچەندە لەبەرخاتری ئەویش نەبوو.

(( ڕەوەز ئەڕوات و گوڵزاریش.. ئەردەڵان کەمێک خۆی ئەتەکینێت و ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١١٣٧ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن دانیشتووەو هاوکار پیاڵەیەکی بەتاڵی بەدەستەوەیە بیباتەوە))

هاوکار: بەسەرچاو.. چەور بێ؟

نارەوەن: نا بەساقە ئەگەر ئەکرێ بە کلێنسێکیش چەورییەکەی بگرێ.. ئیتر وا ئیشتیهام چۆتە سەر فەلافل هەهە.

هاوکار: وەڵا خۆشە، خواردنی من یا فەلافلە یا نۆکاو یان قاورمە.

نارەوەن: یەعنی تۆ هەر بە نۆک ئەژیت ڕۆڵە هەهە، هەرسێکی هەر نۆکە.

هاوکار: بڵێم چی؟

نارەوەن: ئەم نیوەڕۆیە نۆک نابێت، بەیەکەوە ئەچین بۆ چێشتخانەو شتێکیتر ئەخۆی.

هاوکار: نەبەخوا نارەوەن خان، دەستت ماچ ئەکەم، چۆن شتی وا ئەبێ.. خۆم نان ئەخۆم خەمت نەبێ.

(( دیدەوان دێت و گوێ هەڵئەخا))

نارەوەن: نا کوڕم پێمخۆشە بەیەکەوە نان بخۆین، تۆش وەکو کوڕەکانم وای، فەرقتان چییە؟

هاوکار: خوا کوڕەکانت بۆ بهێڵێ یاخوا، بەڵام بەخوا لە ڕووم نایەت.

دیدەوان: بڕۆ، بۆ ناچی لەگەڵیا؟ کێ خوا ئەیداتێ دەعوەتی شاژن بێ؟

(( هاوکار ئەڕوا))

نارەوەن: ئەو کەسانە خەیاڵ و ئەندێشەی زۆریان هەیە کاک دیدەوان.. پێم سەیر بوو سێ ژەمە بەس نۆک ئەخوا، ئەمەوێ ژەمەکەی بۆ بگۆڕم.

دیدەوان: دوور لە قسەکەی تۆ هەردووچاوی دەرئەهات، یاڵڵای ئەکرد بەردی ئەخوارد.. گرنگ تۆی بەردەوام باش و جوان بخۆی. ـــــ تابع ـــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١١٣٨ – متبوع - ڕ/ن – کۆمپانیای تازە – ژووری دیدەوان:

(( هاوکار دەرگای دیدەوان ئەبینێ کەمێک کراوەتەوە.. لەسەر مێزەکە سەماعەی ئەنصاتەکە ئەبینێ.. دیقەتی باشی دەرگا ئەدا چۆن کراوەتەوەو دواتر سەماعەکە چۆن دانراوە.. بە پەلە ئەچێ سەماعەکە ئەکاتە گوێی))

# (( ئەڵقەی پەنجاو پێنج))

دیدەوان(( بەسەماعە)): من هەموو شتێ ئەکەم بۆ دەسکەوتنی پێکەوە نانخواردنێکی وەک ئەوە، کەچی تۆ بەو پاتاڵە پیسەی ڕەوا ئەبینی و بە من نا.

نارەوەن: تۆ قەت نایبینی، با پێت بڵێم بۆ؟

(( هاوکار بە پەلە سەماعەکە دائەنێت لە جێیەکەی خۆیداو ئەچێتە دەرەوەو دەرگا وەک خۆی ڕائەگرێتەوە.))

Cut

دیمەنی – ١١٣٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو هەندرێن سەرقاڵی حساباتێکن.. ساماڵ کوڕێکی ٢٧- ٣٠ ساڵ، جلوبەرگی ئاسایی و کەمێک هەژاریی پێوە دیارە، دێتە ژوورەوە، پاش سڵاو))

ساماڵ: تریفەخان من ساماڵی برای ڕاماڵی ڕەحمەتیم.

(( بە گەرمیی بەخێرهاتنی لەلایەن تریفەوەو هەندرێنەوەو فەرمووی دانیشتن کردن و دانیشتنی.. هەندرێن ئیزن وەرئەگرێ و ئەڕوا ))

ساماڵ: تریفەخان چۆن بتوانم تیرۆژخان ببینم؟

تریفە: لە خزمەتداین بەسەرچاو، وەرە بۆ ماڵەوە.. ئیشێکت پێی هەبوو؟

ساماڵ: ماڵتان ئاوا بێ.. ڕاستیەکەی خۆت ئەزانی براکەم لە هیچ و خۆڕایی کوژراوە.

تریفە: خواعافویکا، ناوجەرگی ئەوە بەئاو بێ دەستی چووە خوێنی ئەو گەنجە جوانە.. بەڕاستی داخێکی گران بوو.

ساماڵ: تازە ناگەڕێتەوە.. ئەمەوێ تیرۆژخان ببینم، بزانم سەرنجی لەسەر هیچ شتێک هەبووە، یان کەسێکی بینیبێ بە دوایەوە، یان لەگەڵ هیچ کەسێکا کێشەی هەبووبێ و هاوڕێیەتی کێی کردووە لەو ماوەیەداو ئیتر هەر شتێک بزانێ بۆ من باش ئەبێ.

تریفە: ئێستا لە ماڵەوەیە.. پێتخۆش بێ ئەچین بۆلای.

ساماڵ: نەوەڵا ماڵ نا.

تریفە(( هەڵئەسێ)): بابە خۆ تۆ بێگانە نیت بە ئێمە ؟ هەستە با بڕۆین.

ساماڵ: نا بەخوا خۆت عەزێت مەدە تریفەخان نایەم.. ئەگەر بکرێ لە شوێنێک ببینم، مەمنون ئەبم.

تریفە: سەیرە! ئەی بۆ نایەی بۆ ماڵەوە؟

ساماڵ: زۆر سوپاس.. ئەوەم بۆ بکەی سوپاست ئەکەم.

تریفە: باشە کاک ساماڵ، بەسەرچاو، لەگەڵ براکانیشم قسە ئەکەم و سبەی ئەم کاتانە تەشریفت بێنە بۆ ئێرەو ئەیهێنم بۆ ئێرە.

سامال (( هەلئەسێ)): زۆر سوپاس، مەمنون.. بەیانی دێمەوە.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن.. بیرکردنەوەی تریفە))

Cut

دیمەنی – ١١٤٠ – ڕ/ د – دوکانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان لە ناو دەرگای دوکانەکە کورسییەکی داناوە ))

<u>ئەردەڵان مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

ئەردەڵان((توڕەیە)): دەی خۆ نەموتووە ناشرینە، تا خوا حەزکا جوانە.. ئەرەوەڵا ئەوە بێنم و بچمەوە دێکەی خۆمان، هەموو ئەڵێن ئەشەدوو ئەردەڵان ئیشی خۆی کرد.. بەڵام ئەویش هەر بەڕێم ئەکا، ئەوەچی بوو پێی کردم ئەی هاوار؟ ئاخر چۆن یەکێ حەزی لێکردبی وا ئەکا؟.. ئەی چۆن ئەتوانم بیهێنم، بەخوا دیارە دڵی لای من نییە.. نەوەڵا.. جا خۆ من هیچم نەکردووە ئەم بەزمەی سازان، دەی وەرە دەست بدەم لەدەستییەوە(( کەمێک ڕامان)) کورە حەددیان چییە بە من ڕائەبوێرن؟ هیچ ناکەن ئێستا من ئەکەن بە دوژمنی خۆیان ها؟ هەههەه کە منیش خەیاڵم خاوە خوایە گیان، تۆ سەیریکە بیر لە چی ئەکەمەوە؟ هەههەه.. کورە ئێستا هەموو خواخوایانە من لێیان ڕازی بم، ئەی چۆن؟.. لەم ڕۆژەیا کێ ئەتوانێ پیاوکوژ بێ؟ جەربەزەیەکی وەک من نەبێ (( پۆز لێ ئەدا)) ئەوەتا کردوومیان بە خاوەن دوکان و پارەو هەموو شتێک.. ئیتر چیم ئەوێ؟ هەر ئەم شێتە ماوە بۆم بێنن و تەواو.. (( بەخۆدا ئەچێتەوە)) نەوەڵا ئابڕووی بردم لەبەرچاوی هەموویانا... بەخوا ڕەنگە تاقیکردنەوەش بێ.. ئەی چی؟ ئەڵێ بزانم چەند بۆم سوتاوە؟.. ئەرێوەڵا سوتاوم، عەیبە؟ خۆ عەیب نییە!... بەڵام تۆزێ خۆم قورس بگرم باشە، وا زوو نەچمەوە بەلایا.

<u>مۆنۆلۆژ تەواو</u>:

(( هەڵئەسێ و خۆی گورج ئەکاتەوەو جلەکانی چاک ئەکات و دائەنیشێ قاچ ئەخاتە سەرقاچ، تووڕە خۆی دەرئەخا ))

Cut

دیمەنی – ١١٤١ – ڕ/ د – ناو کارگەی نیگار

(( شەنیا ئەچێ بۆ لای ڕەمزی کە بەدیار دوو کرێکارەوە وەستاوە، بە ئامازە پێی ئەڵێ بچنە ئەولاوە.))

شەنیا: ئەچم نانێ ئەخۆم لەگەڵ تریفەیا.

ڕەمزی: با ئەمڕۆ نەبێ؟

شەنیا: بۆ؟ جیاوازی چییە لەگەڵ بەیانی؟

ڕەمزی: ئەمڕۆ ئیشمان زۆرەو درەنگیش هاتووی، نەک فریا نەکەوین.

شەنیا: ئیش ڕاناکا کاکە گوڵەکەم، هەوڵ ئەدەم زووش بگەڕێمەوە.

ڕەمزی: ببورە لەو زللەیە، زللە لە فیشەک باشترە (( خەندە)) وانا؟

شەنیا(( زۆر ئاسایی)): ئەوە توخوا حەیفت نەکرد باست کردەوە؟ جا ئەوە چییە برای گەورە ئەیەوێ ڕێ نیشانی خوشکە بچکۆلەی بدا.. تکایە بیری خۆتی بەرەوە، هەر هەڵەیەکم کرد تکایە بمهێنەوە هۆشی خۆم، ئیتر بە زللە بێ بە شەق بێ هههە.

ڕەمزی: بەس بە فیشەک نەبێ؟!

شەنیا: نا نا بەساقەوبم ئەوەیان نا، حەز ئەکەم بژیم.. قەت هەڵەیەک ناکەم شایانی ئەوە بم دڵنیابە.

ڕەمزی: دەی باشە کەواتە زوو بێیتەوە،

(( شەنیا لە دوورەوە ماچی بۆ هەڵئەداو ڕەمزی مۆڕەی لێ ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١١٤٢ –ڕ/د - کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن دانیشتووەو هاوکار دێت))

هاوکار: نارەوەن خان شەرمی خۆمم شکاند بەوەی لە خەیاڵی خۆما لەگەڵ ڕەعنای دایکما ئەچم بۆ نانخواردنەکە، ئەگەر برسیت بووە با بچین.

نارەوەن(( پێکەنین)): منیش هەر ڕەعنای دایکتم بەساقەوبم، هیچ فەرقی نییە.. کاتی ناخواردنیشە هەر زۆر باشە، ئەها یەک دەقە خۆم کۆئەکەمەوەو وا هاتم.

هاوکار: تۆ فەرموو من لە دەرەوە چاوەڕێت ئەکەم.

(( خۆکۆکردنەوەی نارەوەن و چوونەدەرەوەی هاوکار))

Cut

دیمەنی – ١١٤٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو نینا دانیشتوون))

نینا: کورە چۆن وا لە ماڵەوە ئیدارە ئەکەم، شەقم ئەبرد نەهاتمایە.

ئاوا: جا وا ئەمڕۆش هاتی هههە.

نینا(( تورەی سوعبەت و پەنجە ڕاوەشاندن بۆ بەرلوتی خۆی)): کورە وام لێمەکە خۆم ئیشێک بدۆزمەوە؟!

ئاوا: ئێرەت پێ خۆشە؟ چ ئیشێکت بەدڵە ئەوە بکە؟ وەرە جێیەکەی من.. ئەشچیتەوە لای پوورە گێلاس، هیچ کێشەم نییە.

نینا: ئەی بۆچی خۆم ئیشێکیتر نەکەم؟

ئاوا: کچێ ئیشمان بۆچییە بەساقە؟ تۆ بەرچاوییت کێشەت بۆ دروست ئەکەن، با یەکێ ئاگای لێت بێت.

نینا: وەڵا بڵێم چی؟ کەواتە ڕەنگە ئێرە باشتر بێ.. ئەی ئەو هەتیوە کەمدووە؟

ئاوا: هیچ نییە، تۆزێ بێ ئەقڵەو تۆزێ کەم ئەڵێ و تۆزێ خاوەو تۆزێ دوورەپەرێزەو تۆزێ ڕەزیلەو تۆزێ ............

نینا(( خەندەو قسەی پێ ئەبڕێ)): بەسە بەسە جا چی ماوە نەیبێ هههە.

ئاوا: بەخوا وایە، کەمێکیش عەمەلییەو کەمێکیش کەمخۆرەو ......

نینا: بەسە بیبڕەوە، هەر نامەوێ بیناسم تەواو، بزانە ئیشێکم بۆدانێ لای خۆت.

ئاوا: هەر زۆر باشە، ژمێریارییەکە لەو وەرئەگرمەوەو ئیشێکیتری ئەدەمێ، تۆ بچۆرە ژوورەکەی ئەو.

نینا: ئەی بەڕاست، خۆشە ژن و مێرد پێکەوە ئیش بکەن؟ هههە.

Cut

دیمەنی – ١١٤٤ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر- ژووری نەخۆش:

(( زوبێرو ئامۆو خدرو هەرمێ و غەمگین لە ژوورەوەن بەدیار باوکی خدرەوە لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتووە))

خدر: زۆر ئاسانە باوەگیان، ئەوەندە ئازارت نابێ بێتاقەتت بکا.

باوک(( بە ئاماژەو لیسن)): قەینا گوێی مەدەرێ.

زوبێر: بەو هیوایەی هەفتەی داهاتوو تەواو بکەویتە قسە.

باوک: ماڵتان ئاوا بێ، ئیشەڵڵا، پەنا بەخوا.

غەمگین: ئێوە بڕۆنەوە کاکە خدر، با هەرمێش لەماڵەوە بێ، من بەدیاریەوە ئەبم.

خدر: زۆر باشە، بەیانی کاتی نەشتەرگەرییەکە ئەگەڕێینەوە.

ئامۆ: لێرەش هەرچیت ویست غەمگین گیان داوای بکە، من ڕامسپاردوون بە دەمتانەوە بێن.

هەرمێ: قسوریتان نەکردووە کاکە ئامۆ.. ماڵئاوابێ.

(( سوپاس کردن و ڕۆشتن و جێهێشتنی باوک و غەمگین))

Cut

دیمەنی – ١١٤٥ – ڕ/ن – قاوەخانەیەک:

(( گوڵزارو زاهید ))

زاهید: ئەزانم.. ڕەوەز کەڵکی قسەی نییە، تورەو ترۆیە، هەرچی وت ئۆکەی بۆ بکە.

گوڵزار: وامکردووە، بێ ئەمریی ئەوم پێ ناکرێ، بەڵام زۆر بێزارم لەو ئەردەڵانە.. ئێستا ئەیوت بچۆ سەرێکی بە، بە هەزارحاڵ خستمە بەیانی.. باوەڕ بکە لە هیچ شتێک ناترسم، کەچی لەو کابرایە زیرەم کردووە.

زاهید: هههە هیچ نییە گوڵە گیان، هەر ئەوەیە تۆزێ ئەقڵەکەی بۆشە.

گوڵزار: ئێ منیش وەک شێت ئەیبینم بۆیە ئەترسم.

زاهید: دەی بەڵکو ئیشەڵڵا بە بڕێکەوە بگیرێ و تۆ ڕزگارت بێ لە دەستی.

گوڵزار: ئەی چۆنە ئەمجارە خۆمان ڕێی گەڕانەوەی بە ئاسایش بڵێین.

زاهید (( حەپەساو )): چەتیو زۆر مەترسیداری.. ئەی نازانی خۆمان چۆنمان لێ ئەشێوێ و ڕەوەزیش ئەگیرێ و داروبەرد ئەدرێ بەسەریەکا؟ توخوا ئەوە بەڕاستت بوو؟

گوڵزار (( نینۆکی لە دەمیاو یاری پێ ئەکا )): ڕاستی چی لە داخی دڵم وا ئەڵێم.

زاهید: بیر لە شتی وا نەکەیتەوە کچێ، بیللاهی دەستت بە پەڵەی هەورەوە بێ ڕزگارت نابێ.

گوڵزار: ئەوە تۆ بۆ هەموو شتێک ئاڵۆز ئەکەی؟ ئەکرێ شتێ بۆ سوعبەت و لە خەفەتا بیڵێم، تۆ بە جددی وەریگری؟ هەتیو وامزانی هەر ئەردەڵان شێتە!

زاهید: منیش زۆر لەو تەواوتر نیم هههەه.

——— Cut ———

دیمەنی – ١١٤٦ – ش / د – سەرشەقام:

(( سەرچڵ و دڵنیا پیاسە ئەکەن و لە لوولەیەکدا گەنمەشامییان بەدەستەوەیە ئەیخۆن))

سەرچڵ: ئاخر تۆ وریایت، بۆیە ئەمجارەش وامکرد هەر خۆت ئەم ئیشەش بکەی.

دڵنیا: بەخوا ئەویتر خۆش بوو، تێروپڕمان لە کابراشداو پارەیەکی مفتیشم وەرگرت، هههه بەس ئەمەیان ئاسان نییە سەرچڵ.

سەرچڵ: بۆ گیانەکەم، ئەمە هەر زۆر ئاسانترە، ئیشی خۆتە.

دڵنیا: نا.. دەتوخوا وا مەڵێ، بەخوا دەستم لە تەفرەدانی کوڕان هەڵگرتووە لەو ڕۆژەوەی بەڵێنم پێداوی.

سەرچڵ: نا دڵەکەم.. ئەمەیان هەر ئەوەندە بکە کابرا وا لێ بکەی دوات بکەوێ و هیچیتر، بێ ئەوەی زۆر ڕووشی بدەیتێ یان هیچی ئەوتۆی لەگەڵ بڵێی.. ئەم کابرایە قورسە، ئەوان وایان بە من وت.

دڵنیا: خۆی بۆ قورسیی هیچ پیاوێک لای من ئەوەندە قورس نییە دەربازی بێت.. بەڵام ئەی ئەگەر لە کۆڵم نەبۆوە؟ چی بکەم؟

سەرچڵ: چاوەکەم من پێموتون ئەوەندەی وایلێئەکا عاشقی بێت و ئیتر من دووری ئەخەمەوە.

دڵنیا: ئەی ئەوە سوودی چییە؟

سەرچڵ: نازانم، ئیشیان بەوەندە هەیەو تەواو.

دڵنیا: چەند ئەدەن؟

سەرچڵ: واو پارەی سەیارەش زیاتر.. ئەبی بە خاوەنی سەیارەی خۆشت، ئیتر چیت ئەوێ؟

دڵنیا: باشە هەندێ شتم لەسەر کابرا پێ بڵێین و لە کوێوە دێت و بۆ کوێ ئەڕواو ناوەکەی و...........

سەرچڵ: قسەی پێ ئەبڕێ.. تا ئێستا تەنها ناوەکەیان پێوتووم، ناوی حەمەخدرە.. ئیتر چاوەڕوانی ڕازیی بوونی تۆ ئەکەن.

دڵنیا: با بزانم چیم پێ ئەکرێ؟

سەرچڵ: نا بڵێ هیچ کەسێ لە دەستم قوتاری نابێ.. ئەوەم ئەوێ، با دڵنیابم لەوەی هیچ دڵەڕاوکێیەکت نییە.

دڵنیا: با بزانین، هەوڵی باش ئەدەم، خەمت نەبێ.

(( بەردەوامیی پیاسە))

Cut

دیمەنی – ١١٤٧ – ش/ن –ماڵی نیگار – ژووری دەوران:

(( دەوران و شەنیا ))

دەوران: نامەوێ تۆ سارد بی لەگەڵما دەوران گیان.. من بەردەوام پێویستیم بە ئەقڵە جوانەکەی تۆ هەیە.

دەوران: یەکێک لەو شتانەی لەم ماوەیەی دووایییا وا ئەکا لێت دوور کەومەوە، تێر کردنی غروری بەرامبەرەکەتە شەنیا گیان.. تۆ باسی ئەقڵی من ئەکەی جوانەو لە کاتێکا باشیشت ئەناسم کە ئەقڵی خۆت لە هەموو کەسێ لا پەسەندترەو خۆشت بە ئاقڵترین ئەزانی.. ئیتر بۆ ئەتەوێ بەو قسانە بێ بایەخانە غروری من تێر بکەی.. ئەزانی ئەوە مانای چییە؟

شەنیا: مانای ئەوەیە من بە دڵ بوونی تۆم پێخۆشەو ئەمەوێ بەردەوام هەبیت.

دەوران: بەڵام هیچ شتێک شک نابەی بۆ هێشتنەوەی من، غرور تێرکردنم نەبێ، من کەسێکی هاکەزایی نیم ئەو قسانەتم پێ خۆش بێ، بەڕاستی خەفەت ئەخۆم کاتێ پیاما هەڵئەدەیت.. هەست ئەکەم شتێک نەماوە پێکەوە بمانبەستێتەوە.. جیهانی تۆ پڕ بووە لە جەمسەری ترو منیش بەشێکم لە لە ڕابردووت.. ڕاستییەکەی من ئێستا ئێستا.. ئاوا ئەیبینم.

شەنیا: بەهەڵەیا چوویت دەورانی گوڵ.

دەوران: دەستمان پێکردەوە، گوڵ؟ ها؟

شەنیا: هەمووی خۆشەویستییە دەوران گیان.. من ڕەنگە کۆڵ بم لەوەیا چۆن گوزارشت لە خۆشەویستیی خۆم بکەم بۆ تۆ، بەو شێوەیە نەبێ.. بەڵام ئەو قسانەی تۆ زۆر ئاسانن.. ئەی بۆ من نەڵێم تۆ کەوتوویتە ناو کەسوکاری تازەوەو ئەتەوێ لە من دوورکەویتەوە؟

دەوران: شەنیا گیان باش گوێم لێبگرە.. با تێتگەیەنم بناغەی هاوڕێیەتیی چەند لە پەیوەندیی کەسوکار شیرینترە، بنەڕەتی هاوڕێیەتیی بریتییە لە ڕاستگۆیی و ڕوونیی

و ڕاشکاویی و دڵسۆزیی و لەیەکچوونی باوەڕو متمانەو توندوتۆڵیی پەیوەندیی و زۆریتریش تاقەتم نییە هەمووی بڵێم، بەداخەوە لە چاوتا کەمترینی ئەبینمەوە.

شەنیا: هەست ئەکەم غەدرم لێ ئەکەی دەوران، تۆ قەت وا نەبووی.

دەوران: کچێ ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ ئێستا کە قسەم لەگەڵا ئەکەی، تەنانەت سوور نیت لەسەر داکۆکی کردنت لە ڕاستگۆیی خۆت و خەیاڵت لە شوێنێکیترە شەنیا گیان.

شەنیا: پێت وا نەبێ، پەیوەندییەکم هەبێ و بۆ تۆم باسنەکردبێ، خەیاڵت بۆ ئەو شوێنانە نەچێ، من هیچ شتێکی شاراوەم نییە، بە تایبەت لەگەڵ تۆدا.

دەوران: من لە چاوتا کێشەی زۆر ئەخوێنمەوە، نەک پەیوەندیی.. لەگەڵ کێشەکانتا بە قسەشتەوە دیارە، پڕیت لە ئاڵۆزیی و داپۆشین و شاردنەوەی ئەو جیهانەی ئێستات.

Cut

دیمەنی – ١١٤٨ – ش/ د – باخی ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن لە لایەکیترەوە تێل ئەکات و ئەگەڕێتەوە بۆلای تریفەو تیرۆژ))

تیرۆژ: ها دایە ئەڵێ چی؟

نارەوەن: ئاسایی وەریگرت.

تیرۆژ: ئەی وایە، چی لەوە؟ من کێشەم هەیە، خۆ کاک حمەخدر چ نییە، باکی چییە؟

نارەوەن: نا ڕۆڵە حمە خدر دڵسۆزتانە وا سەیری مەکە.. بەڵام ئەوە هەیە، ئەو ورد ئەڕوانێتە شت و پەلەی تیا ناکا.. ڕاستە ئەوی لە کێشەدایە دڵگەرمترەو لە چرکەیەکدا دەیان غایەڵە ئەکاو وەک ئەوی دەرەوەی کێشەکە نییە.. ئەڵێ بزانن بەیانی چی ئەڵێت و لەسەر ئەوە ئیش ئەکەین.

تریفە: خۆ کوڕێکی باش دیار بوو، بەڵام وا بەیانی دەستێکی لە تیرۆژ وەشاند؟!!! بە برا نەڵێین و کەسێک لەوێ نەبێ، چۆن ئەبێ؟

نارەوەن: پێموت.

تیرۆژ: ئێ؟

نارەوەن: ئەڵێ خەمی ئەوەتان نەبێ، یەک دوویەک ئەنێرم ئاگاداری تیرۆژ بن.

تریفە: ئەوە زۆر باشە.

تیرۆژ: دەی ئەگەر وابێ، باشە، پێویست ناکا بە کاکم و ئاواش بڵێین.

نارەوەن: نەبابە، هیچ پێویست ناکا.. هەر خۆم دێم و بەسە.

تیرۆژ: نەوەڵا تۆ مەیە، تۆ بچۆ بەلای ئیشی خۆتەوە، سوور ئەزانم تۆ بێی نیوەی پارەکەشی بۆ ئەگێڕیتەوە، ئەڵێی با هیچ ڕوونەدا.. مادام خەڵک هەیە بمپارێزێ، خۆم ئەزانم چۆن بەڕێی ئەکەم.

نارەوەن: کچم تۆزێ ئاقڵ بە........ با من...........

تیرۆژ(( قسەی پێ ئەبڕێ)): هەر زۆریش ئاقڵم، توخوا لێمگەڕێ دایە. (( ئەچێتە ژوورەوە))

نارەوەن: ئەرێ ڕۆڵە ئاخر ئەبێ لە کێشەیەکی وا گەورەیا، نە دایک و نەبرا کەسی لەوێ نەبێ؟

تریفە: ئەی چی بکەین دایە گیان، هەر قسەیەکی لەگەڵ ئەکەی ئاوا بەلەسە ئەبێ.

نارەوەن: دە چاوی دەرئەهات.. بەڵام هەر خۆم پێ ناگیرێ بەخوا.. دێم لای هەندرێن، یان لای نیناو ئاوا بم باشترە.

تریفە: نەوەڵا ڕێک بچۆ بۆسەر ئیشەکەی خۆت، هەرچییەک بوو بە تەلەفونێک ئاگادارت ئەکەمەوە.

نارەوەن: نا نا.. با جارێ بزانین چۆن ئەبێ.

Cut

دیمەنی – ١١٤٩ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان و ڕەمزی دانیشتوون))

دیدەوان: باشترە، خەریکە نەرم بێ.. ئەمڕۆ پاکانەی ئەوەی ئەکرد کە خدر تەنها وەک کوڕی وایەو هیچیتر.. هەست ئەکەم بۆ ئەوە پاکانەی ئەکرد تا لێی نەکشیمەوە.

ڕەمزی: ئەی ڕاستە ژنەو لە تەمەنێکایە پێویستیی بە هاوسەرە، چی لە کوڕو کچ بکا هەریەکەیان بە ژیانی خۆیانەوە خەریکن.. دواتر تەنیاییەکە هەر بۆ ئەم ئەمێنێتەوە.

دیدەوان: دڵنیام لە ئەنجامەکەی.. دوو مانگیتر نابا پێکەوە لە ماڵێکا ئەبین.. ئەوسا کاکە خدرەکە ئەکەین بە هەموو شتێک و نازناوی پاشایشی ئەدەینێ وەک دارەوان و ئێمەش لە بەروبوومەکەی ئەخۆین بێ ئەوەی قولە پێمان تەڕ بێ.

ڕەمزی: من نایەمە پێشەوە لە خدر، کە گیرا منیش تووش ئەبم.

دیدەوان: بۆ وا ئەزانی من ژن هێنانم لەبەرخاتری نارەوەنەو بەزەییم پیایا دێتەوە؟ من لە ڕێگەی نارەوەنەوە خدر دائەکوتم.. هەرکات گیرا، ئەوسا ئەو دڵی نایەت ناوی نارەوەن بدا.. منیش خۆمیان تێناگەیەنم، بۆ پارەکە نەبێ، ئەویش هەر نارەوەن ئەیهێنێتەوە من نیم. (( پێکەنین)) من و تۆی داماو ئاگامان لە چییە تا ناومان بهێنرێت..؟

ڕەمزی: زۆر جوانە سەرۆک.. شەڵڵا کاتی دارەوان و هەڵشۆو سەرداریش دوور نەبوویتایە، قەت ئەوەیان بەسەر نەئەهات.

دیدەوان: نا.. نزیک بوومایە هەموو تێوەگلابووین.. باشتر کە وابوو.

ڕەمزی: ئێستا داوای چوار کیلۆم لێکراوە، دوو کیلۆمان هەیە.

دیدەوان: باشە، ئەوەیان بۆ بنێرەو لەم هەفتەیەشدا ئاگاداریان ئەکەمەوە ١٢ کیلۆم بۆ بنێرن.. بەو کچ و کوڕانە بڵێ خۆیان ئامادە بکەن، بە شێوەی سەفرەی خێزانیی بۆی بچن.. با هەتیوە شیرینیی فرۆشە ورگ زلەکەشیان لەگەڵ بێ.

ڕەمزی: من بە ڕەوەز ئەڵێم ئامادەیان بکات، بەڵام بۆ ئەویشی تیابێ؟

دیدەوان: لە کوشتنەوە گلاوە، با لەمەشەوە بگلێت باشە.. ئەوسا بۆ ماوەیەکی زۆر تا ئەگیرێت، هەموو شتێک هەر بەو ئەکەین و هاوکاری بۆ دائەنێین.. دواتریش ئەوپەڕی ڕەوەز خۆی ون بکاو تەواو.

ڕەمزی: داواکەش بۆ خدر چنراوە، کچەکە بە نیازی ئیش تیاکردنیەتی.

دیدەوان: پەلەی خدرت نەبێ، تا بە شێنەییتر خۆی بدا بەدەستەوە، پلانەکەم باشتر سەرئەگرێ.. بەکاوەخۆ با خەریکی بێت.. هەر لەگەڵ ئەمەشدا پلانێکیترم بۆی هەیە جێبەجێی بکە، بەڵام لەو خێراتر، چونکە هەم سادەو هەم کاریگەرە.

ڕەمزی(( خەندە)): خدر ئەکەم بەقوربانت پێم بڵێ ئەو چییە؟

Cut

دیمەنی – ١١٥٠ – ڕ/ن – ناو دوکانی شیرینی:

(( گوڵزار دێتە ناو دوکانەکەوە، ئەردەڵان ئەترسێ))

ئەردەڵان: ئەوە بۆ هاتیە ژوورەوە؟ ئەمجارەیان بە نیازی چیت؟

گوڵزار: دانیشە دانیشە یاخوا زیرەکەی، وتم نەک کابرای خاوەن کۆمپانیاکە لێرە بمبینێ، بۆیە هاتمە ژوورەوە.

ئەردەڵان: چیت ئەوێ؟ با بتدەمێ و بڕۆ.

گوڵزار: گاڵتە ئەکەی، ناتەوێ بڕۆم.. تۆ کە من ئەبینی ئاگات لە دنیا نامێنێ.. منیش هەر تۆ شک ئەبەم بێمە لای و نازو بازێ بکەم.

ئەردەڵان: نا.. لێت عاجزم، نازوباز بۆ من مەکە.. تۆ لە گوزەرەکەیا حەیات بردم.

گوڵزار: هەواڵێکی خۆشم پێیە بۆ تۆ.. بە دوو کیلۆ شیرینیی ئەتدەمێ.. ئەیبەم بۆ ماڵی خاڵم، ئەوەی ئەو ڕۆژەیان زۆر بەدڵ بوو، وتیان لەوەمان بۆ بهێنەرەوە.. منیش وتم ئاسانە، لای مایڵەڤ بۆتان ئەهێنم.

ئەردەڵان: هەواڵەکە بڵێ، شیرینیت بە بێ هەواڵیش ئەدەمێ.

گوڵزار: لەم هەفتەیەدا ڕێک من و تۆو کوڕێکی هاوڕێم ئەچین بۆ گەشتێکی خۆش لەو شاخ و کێوانە.. ئیتر سەرما دێت، کەڵکی گەڕانمان نامێنێ.

ئەردەڵان: ئەی ناکرێ کوڕەکەی هاوڕێت نەیەت؟

گوڵزار: چوک.. بە تەنیا لەگەڵ تۆ نا.. حەز ئەکەم تۆڵەی ئەو هەڵەیەت بۆ بکەمەوە کە ڕوویدا، ئەگەر ناشیەیت؟ ئەوە هیچ.

ئەردەڵان: چۆن نایەم دڵەکەم؟ ئەگەر حەز بکەی هەر بە ڕاکردن بەدوای سەیارەکەتانا ڕا ئەکەم.

گوڵزار(( پێکەنین)): وەڵا خۆ بۆ ورگەکەشت باشە، دائەبەزێ. ______ Cut ________

دیمەنی – ١١٥١ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو ساماڵ و شەنیاو تیرۆژ))

تیرۆژ: لەو زیاتر هیچ کەسێکیترم نەدیوە لەگەڵیا.. ئەویش بەڕاستیی زۆر دڵسۆزی بوو. زۆر بۆ یەک باش بوون.. ئەشمزانی هاوڕێی ئەم شەنیاخانەو دەورانی خوشکیشم بوو، خۆی بۆی باس ئەکردم، هەر ئەوەندە.

ساماڵ: ئەی تیرۆژخان، چۆن قسە لەگەڵ دەورانی خوشکتا بکەم؟ ئاساییە؟

شەنیا: هەموو هاوڕێیەتیەکەی لەگەڵ دەورانا بەهۆی منەوە بوو.. من ئەوەت تێئەگەیەنم خەمت نەبێ. مەچۆ بۆ لای ئەو.

ساماڵ: زۆر سوپاس، ئەی تۆ هیچ شتێک شک نابەی لەسەری کوژرابێ؟ باوەڕ بکە زۆر حەز ئەکەم شتێکی وا ڕوویدابێت، شایانی ئەوە بووبێت لەسەری بکوژرێ، ئەوسا منیش ئەحەسێمەوەو بەردێکی ئەخەینە سەرو هەموو شتێک کۆتایی دێت.

شەنیا: ڕاستیەکەی ئەوەندە یەکترمان نەئەبینی بکەوینە وردەکارییەوەو لە ژیانی تایبەتیی خۆی ئاگادارم بکاتەوە.. بەڵام ئیش بە پەلە ناکرێ کاک ساماڵ.. ژمارەکەتمان لا جێهێڵە، هەرکامێکمان هەر ڕستەیەک یان سەرەداوێک بە بیرمانا بێتەوە، پێت ئەڵێین.. ئەوە ئیشی ئەم دەمودەستە نییە براکەم.

ساماڵ: زۆر ڕاستەو من منەتبارتان ئەبم، هەر یەک وشەشم پێ بگەیەننەوە.. جاری وا هەیە وشەیەک ئەبێتە هۆی دەسکەوتنی شتی گەورە (( لەسەر کاغەزێک ژمارەکەی ئەنوسێت)) کەواتە شەنیاخان بۆ ئەوەی خۆت وتت تێت ئەگەیەنم، هەرکاتێ بۆت ڕەخسا تەلەفونم بۆ بکە بتبینم.

شەنیا: بە خۆشحاڵییەوە گەر بتوانم خزمەتێکت بکەم.. ئێستا ئەگەڕێمەوە بۆ کارگە، ئەگینا لە شوێنێک دائەنیشتین، تا زۆر ڕێ لەمان نەگرین.

تیرۆژ: بۆ مەسەلەی داهاتی چاپخانەکەش.............

ساماڵ: نا تکایە هیچ لەو بارەیەوە مەڵێ.. تۆو ڕاماڵی جوانەمەرگ هەر پارەو پولێکتان هەبووبێت، هیچ پەیوەندیی بە ئێمەوە نییەو بۆ ئەوەش نەهاتووم.

تریفە: کاک ساماڵ مادام کوڕی ئێوە بووە.. هەقی خۆتانە لەوەش بێ بەش نەبن کە جێی هێشتووە.. تیرۆژی خوشکم بۆ ئاسوودەکردنی ویژدانی خۆی، مانگانە بەشێک لە داهاتی ئیشەکە ئەگێڕێتەوە بۆ دایک و باوکت و ئیتر خۆیان چی لێ ئەکەن سەربەستن.

ساماڵ: ماڵی ئاوا بێ، پەک ناکەوێ.. ڕاستیەکەی بۆ منیش نییە قسە لە کاری دایک و باوکما بکەم.. لەگەڵ خۆیان قسە بکا باشترە.. بەڵام وەک خۆم، پێمخۆش نییە جارێکیتر ئەو باسە بکەینەوە.

(( هەستانی شەنیاو تیرۆژو ساماڵ و خواحافیزیی))

____ گەڕانەوەی هەیە __________ Cut ______________

دیمەنی – ١١٥٢ – ڕ / ن – ناو نەخۆشخانەی زوبێر:

(( بە چەند دیمەنێکی میوتی و دیالۆگی پێویست.. بردنی باوکی خدر بۆ نەشتەرگەریی و پشکنینەکان و هاتنە دەرەوەو خستنەوە سەر جێگەی خۆی.. ئەوانەی هەن لە دیمەنەکاندا، خدرو غەمگین و باوک و هەرمێ و ئاواو نارەوەن و ئەحەو کارە))

Cut

دیمەنی – ١١٥٣ – ڕ/د – عەسر – ناو باخچەی نەخۆشخانەی زوبێر:

(( نارەوەن و خدر))

خدر: ئەو ئەڵێ چی؟

نارەوەن: وتی پێکەوە باسی بکەین و بڕیارێکی لێ بدەین و وەڵامی ئەویش بدەینەوە.

خدر: ئەگەر بە یەکجاریی ڕەتی بکەیتەوە، بە بیانوویەک کۆمپانیاکە دائەخەن و تۆش دێیتەوە بۆلای ئێمە.

نارەوەن: پێ ناچێ ژن بڕابێ حەمەخدر.. فشاری ئەم کابرایە بۆسەر من لە ژن دەستنەکەوتنا نییە.. ئەم کابرایە شتێکی بەدەستەوەیەو ڕوون نییە.

خدر: ئۆکەی.. ئەتوانین وا بکەین ئەوەمان دەستکەوێ و تۆش ڕزگارت ببێ لە چنگی.. بەڵام کەمێک قسە نەرم بوونی تۆی پێویستە، هێمنتر بە لەگەڵیاو نە بەڵێنی بدەرێ و نە فەرامۆشیشی بکە..

نارەوەن: نا ئەمڕۆ هیچم نەوت، پێمباش بوو پرس بە کاک ڕاهۆز بکەم ئەوسا بڕیار بدەم.. وتم کاتم بدەرێ بیری لێ بکەمەوە.

خدر: زۆر باشتکرد.. ئێستا بە هۆی باوکمەوە سەرقاڵم، دواتر بە وردی بیری لێ ئەکەمەوەو شەو قسە ئەکەین و وەڵامی کاک ڕاهۆزیش ئەدەینەوە.

نارەوەن: شوکر باوکیشت زۆر باشە.. کاک ڕاهۆزیش وتی منیش لەگەڵ برادەران باسی ئەکەم و گەیشتینە هەر بڕیارێک پێت ئەڵێمەوە.. وا بێ شتەکە بە پرس و ڕاوێژی هەموو لایەک بێت.

خدر: هەموو مەرامیان لای تۆوە دەرئەکەوێت.. وریایی زیاترمان پێویستە.

نارەوەن: خەمت نەبێ.. ئا بیرمکەوتەوە.. ئەزانی گوێ لە دەنگیشمان گیراوە؟ ڕاست دەرچوو.

Cut

دیمەنی – ١١٥٤ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١١٥١ –ڕ/ن –ئۆفیسی وەکالەت:

(( بەڕێکردنی سامانڵ و شەنیاو گەڕانەوەی تیرۆژو تریفە.. تریفە بە پێکەنین و خۆشحاڵیی زۆرەوە بە خێرایی باوەش ئەکا بە تریفەیاو ماچی ئەکا ))

تیرۆژ: قوربانت خوشکە گەورە باشەکەم..(( هەردوو ئانیشکی ئەگرێ)) ڕزگارم بوو خوشک گیان تەواو، ئیتر خەمی هیچ هیچم نەماو لە هەمووی خۆشتر، قسەی کەس وا دەرنەچوو هههە (( باوەشی پیا ئەکاتەوە)) بەساقەوبم.

تریفە: پیرۆزە، پیرۆزت بێ یاخوا، بەخوا شایانی زۆر لەوە زیاتری تیرە گیان.. با تەلەفونیش بۆ دایکم بکەم، دڵنیای بکەمەوە.

تیرۆژ: قوربانت قوربانت.. وۆۆۆۆووو تەواو.

(( تریفە تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١١٥٥ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێرو بروسک و ڕێژوان و چیمەن و ساواکە و سەلوا ))

زوبێر: ماڵی ئاواو دایک و خوشک و براکانی و خەزورانی و هەندرێنی (( ئاماژەی سەلوا ئەکا )) برای و حەمەخدرو تەواو.. کەسیتر تێناگەیەنین.. بە هێمنی کارەکە بڕوات و .......

چیمەن: خانم مارە بکرێ.

زوبێر: دەمخۆش.. گواستنەوەش بۆ دوای کۆبوونەوەمان لە گەڕەکی ئەوان.

بروسک: بەخوا وام پێ باشترە مامە گوڵەکەم، ئێمە دەست لە خۆمان نەدەین و هەر خۆت بچیتە ئەوێ و ئێمە هەر دێین، خۆ لە بنی دنیا نابی.

زوبێر: ڕێژوان تۆ ئەڵێی چی؟

ڕێژوان: قسەکە جوانە باوکە، ئەم هەمووە بۆ بگوێزینەوە؟ خۆ منالٚ نیین بترسین.

زوبێر: ئەی کچەکان ئێوە؟

چیمەن: خۆتان چۆن بڕیار ئەدەن بۆ من جیاوازیی نییە.

سەلوا: ڕێژوان گیان چی بڵێ ڕای منیشە.

زوبێر: دەی مادام هەموو یەک ڕان، ئەوە منیش بڕیارمدا سبەی مارە کردنەکەو دوو سبەی گواستنەوەم بێ بۆ ئەوێ هاهاها.

(( پێکەنینی هەمووان و پیرۆزبایی ))

Cut

دیمەنی – ١١٥٦ – ش/ د – پاركێک:

(( دڵنیاو سەرچڵ))

دڵنیا: ئەها.. تێگەیشتم، لەگەڵ كچێكایە لە ئۆفیسێک دەوام ئەكا.. هەرچەندە كەمێک قورسترە لەبەر كچەكە.. بەڵام ئاساییە خۆم ئەزانم چۆن ئەیگەمێ.

سەرچڵ: ئۆكەی، جارێ بە باوكییەوە خەریكە نەشتەرگەریی و شتی وای بۆ ئەكەن، كە گەڕایەوە پێم ئەڵێنەوەو منیش ئاگادارت ئەكەمەوە.

دڵنیا: وا بزانە ئەوە كراوەو تەواو.. بەڵام ئیتر دوای ئەوە وەک ئەوەی ئەڵێی پارەیەكی باش ئەدەن و تۆش ئێستا بەهۆی كارگەكەوە قەرزاریت، كاتی داواكردن دێت، ئیتر بیانووت نەما.

سەرچڵ: ئەوە بەڕاستتە ڕوحەكەم، من بیانوو ئەهێنمەوە؟

دڵنیا: ئاخر ئیتر لە هیچت كەم نابێ.. تۆ چەند قەرزاری؟

سەرچڵ: هەر ناوێرم بیری لێ بكەمەوە.. مەگەر كارگە بفرۆشینەوە پارەی خۆم دەست بكەوێتەوە.

دڵنیا: دەی ئەگەر ئەم ئیشە شتێكی لێ مایەوە بیدەرەوە بە قەرزا.

سەرچڵ: ئەوە بە ڕاستتە؟ ئەوە بزانە بە هەموو ژیانم دەست لە پارەی تۆ نادەم بۆ هیچ مەبەستێک.

دڵنیا: پارەی من و تۆ چ جیاوازییەكی هەیە؟

دڵنیا: هیچ.. بەڵام ئیتر سروشتی من وایە، هەرچەندێ زۆرت هەبێ، لەوە دەرچێ لەماڵەكەیا خەرجی ئەكەیت، دەست بۆ هیچ شتێک نابەم.. ئەوباسە داخە.. با پارەكە وەرگرینەوە، قسە لە داواكردن ئەكەینەوە.. جارێ زووە.

Cut

دیمەنی – ١١٥٧ - ش/ن – ژووری شەنیا:

(( شەنیا تێل ئەکا))

شەنیا: ناونیشانی کارگەکەم پێوتی.. بەیانی وەک خزمێکی نزیک کە دەمێک بێ نەمبینی، دێیت و زۆر دڵخۆش خۆت نیشان ئەدەیت و منیش هەروا.. ئەوسا ئەتوانین بە ئاشکرا لە هەموو شوێنێک دانیشین.. بەڵام ئاوا ببورە ناتوانم بتبینم.

ساماڵ(( دەنگ)): خوشکێ گیان زانیاری کوشتنەکەیت لایە؟

شەنیا: تکایە تکایە کاکە گیان، ئارام بگرە، من ناتوانم بۆت دەستنیشانکەم، ڕەنگە سوودت پێ بگەیەنم و هیچیتر.. هیچ پرسیاریشم لێ مەکە، ئەگینا یەک دێڕم لێ نابیسیت.

ساماڵ: بۆ؟

شەنیا: ئای خوایە کورە دەهریی بووم، هیچ مەپرسە بەیانی و دوو بەیانی یەک ئەبینین.. بەسە.

ساماڵ: باشە تورە مەبە دادەگیان.. سەرچاو، بەیانی بەو شێوەیەی تۆ فەرمووت ئاواهی دێم.

شەنیا: بیرت نەچێ، خۆت جوان ئەگۆڕیت، جلی ئوتوکراو، دڵخۆش و کەمدوو، بە هیچ جۆرێک ڕاماڵی ڕەحمەتیت نەناسیوە.. ئەوە زۆر خراپە باشە؟

ساماڵ: بەخوا لەوە ئەچێ شتی زۆر گرنگ هەبێت.

شەنیا: چییە؟ دەستمان پێکردەوە؟ وتم تۆ کەڕو لاڵیت تا خۆم قسەت بۆ ئەکەم.. دەبڕایەوە، با توشی کێشە نەبین.

ساماڵ: باشە، کەواتە شەوشاد من بەیانی بەوجۆرە دێمە کارگەکەت.

شەنیا: شەوتشاد براکەم. (( دایئەخاتەوەو وەیش کردن لە بێزاریا)) توشم نەکا؟

Cut

دیمەنی – ١١٥٨ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ڕەووەز بە پێوەو ئاوا دانیشتووە لەجێی خۆی و نیناش لە شوێنێکیتر))

ڕەوەز(( وشک وەک هەمیشە)): ٢١ تۆن.

ئاوا: ئێ کەواتە بینێرە بۆ لای نیناو خۆشت سەیارەی باری بۆ حازرکە.. قەیچێکا خۆی نەهاتووە، گرنگ ئەوەیە بە لەتیف بڵێ تەواو مەوادەکان بپشکنێ.. دواییش بۆم بانگکە ئیشم پێیەتی.

ڕەوەز: بەسەرچاو.

نینا: هەندێ کاغەزو قەڵەم و مەکینەی دەرزی و لیڤێکسیشم پێویستە، خۆ ژوورەکەت هیچی تیانەبوو.. ژمێریاریی ئەو شتانەشی ئەوێ.

ڕەوەز: بۆم بنوسە ئەنێرم بیکڕن.. ئەمرێکیترتان نییە؟

ئاوا: نا.. بڕێت. (( ڕەوەز ئەڕوا ))

نینا(( دەست ئەگرێ بەدەمیەوەو بە سووکیی پێکەنین)): ڕێک قسەکەی تۆیە، خۆ ئەڵێی ڕۆبۆتە.

ئاوا: هەر ئەوەندەی لەسەر داونلۆد کراوە هههە.

نینا: خوا فرسەتت با.. بەخوا من تاقەتی ئەم دەموچاوانەم نییە، با هەر نەیەت بەلاما هههە.. ئەی کەی بچین سەرێکی باوکی کاک حەمەخدر بدەین؟

ئاوا: هەر ئاوا نیو سەعاتێکیتر.. با لەتیف ببینم، لێیگێڕابوومەوە بیبینم، بزانم چی هەیە.

نینا: ئەها ئەوەی بارەکانت بۆ ئەپشکنێ؟

ئاوا: بەڵێ.

نینا: ئەوە زۆر گرنگە بۆ تۆ؟

ئاوا: ئەی چۆن بەقوربان، لابەلا شتێک بهاونە بارێکەوەو توشی چورتمێکم بکەن، قوڕی کوێ بکەم بەسەرا.. تا قەواڵەی خۆم ئەخوێنمەوە، پێستم ئەگرون هههە.

نینا: ئەوە ڕێوییە وایە.

ئاوا: منیش هیچی وام لەو کەمتر نییە.

نینا(( هەڵئەسێ)): ئۆکەی منیش ئەچم ئەو شتانە بۆ ڕۆبۆتەکە ئەنوسم بیانکڕێ.. هەولبە زوو لێبیتەوە.

ئاوا: گیانەکەم!!!!

(( چوونە دەرەوەی نینا))

Cut

دیمەنی – ١١٥٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە – ژووری نارەوەن:

(( نارەوەن هەردی بانگ ئەکات و هەردی دێت))

نارەوەن: کاک دیدەوانم بۆ بانگکە هەردی.

هەردی: نەهاتووە جارێ نارەوەن خان.

نارەوەن(( تەماشای سەعات ئەکات)): سەیرە نیو سەعات تێپەڕیوەو دیار نییە.. باشە هەرکات دەرکەوت بینێرە.

هەردی: بەسەرچاو،

(( پاش کەمێک دیدەوان دێت و باوەشێ گوڵی گەورەی پێیەو دایئەنی))

دیدەوان: ئەمەش بۆ میهرەبانترین ژن.

نارەوەن(( ئاسایی)): سوپاس دەستخۆش.. دانیشە!

دیدەوان: تۆ ئەمر ئەفەرموویت.. سەرچاو!

نارەوەن: زۆر بیرم لە داواکەت کردەوە.. بڕیارمدا ...................

دیدەوان: توخوا دڵم بە بەریەوە نییە، بڕیارەکەت چی بوو؟

# (( ئەڵقەی پەنجاو شەش))

نارەوەن: بڕیارمدا ڕازی بم بەو هەڵوێستەت و سوپاس بۆ ئەوەی منت هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی هاوبەشیی ژیانت بکەم.. منیش تۆ دیاریی ئەکەم ژیانم لەگەڵا تەواو بکەیت و بەڕاستی یەکترمان خۆش بوێ و تەنها بۆ دڵی یەکتر بژین.. ببینە مایەی دڵخۆشکردنی یەکتر بەم دوادواییانەی تەمەنمانەوە.

دیدەوان: من بەڵێنی ژیانێکت پێ ئەدەم خەوی پێوە ببینیت.. پەشیمان بیتەوە لە هەموو ڕابردووی ژیانت ئەوەندە باش بژیت.. بەڕاستی من پێویستیم پێتە.

نارەوەن: بەڵام مەرجم هەیەو مەرجەکانیشم ئەبێ جێبەجێ بکرێ.

دیدەوان: هیچیان مەڵێ، وابزانە هەمووی جێبەجێکراوە.

نارەوەن: ناکرێ، ئەبێ هەر بوترێ.

دیدەوان: فەرموو.

نارەوەن: من بۆ ئیش هاتمە ئێرە.. ڕاستییەکەی زۆر چاوم لەدوای پارە نییە، بەڵام دڵم بە کۆمپانیاکە خۆشەو ئەمەوێ ببێتە موڵکی خۆم بە تەلارەکەشەوە.. ئەوەت پێ ئەکرێ؟

دیدەوان(( دڵخۆشیی پێوەدیارە)): لە ئاستی تۆدا هەموو سامانی دنیا، سووتووە جگەرەیەکە.

نارەوەن(( دڵخۆش)): زۆر سوپاس.. دووەم من خاوەنی کوڕو کچی گەورەم، ماوەیەکم بدەرێ تا بە شێنەیی هەموویان ڕازیی بکەم و تێیان بگەیەنم.. بۆ ئەوەی منالەکان نەزانن پێشتر خۆمان ڕێککەوتووین، ئەبێ بەڵێنم بدەیتێ تا ئەو کاتە هەروەکو ڕابردوو مامەڵەی یەکتر بکەین، بگرە تۆختریش و ڕێک وەکو خوشک و برا.

دیدەوان: ئەگەر زۆر نەخایەنێت.

نارەوەن: وەک خۆم هیچ پەلەم نییە، بەڵام هەموو شتێکیش سنوری خۆی هەیە.

دیدەوان(( بەگەرمیی)): بە دڵنیایی ڕاستە.

نارەوەن: ناهێڵم لە دوو مانگ زیاتر بخایەنێ.

دیدەوان(( سەرێک با ئەدا)): ئ ء ئء خراپ نییە، قبوڵە.. مەرجی سێیەم؟!

نارەوەن: پەیوەندیت بە ژیانی منالەکانەوە نابێت بۆ هیچ مەسەلەیەکیان، تەنانەت ژن و ژنخوازییش، خۆیان گەورەن.

دیدەوان: کە باش بوو ئەو مەرجە، ئەو بەرپرسیارێتییەشم لەکۆڵ بۆوە. چوارەم.

نارەوەن: ڕاستگۆ ئەبیت لە هەموو سەرچاوەیەکی داراییت لەگەڵما، یەک شتی ئەملاولام قبوڵ نییە.

دیدەوان: بەم نزیکانە هەموو شتێکت پێ ئەڵێم و سەرچاوەی تریش پێکەوە ئەدۆزینەوە.. پێنجەمیش بڵێ، خۆزگە کۆتایی بووایە.

نارەوەن: بۆ مەرجەکان قورس بوون؟

دیدەوان: نەوەڵا هەمووی ئەتوت ڕۆن سەگە ئەدرێ لە قەلبم.. بەڵام ئەترسم.. ئەڵێم نەک مەرجی قورسیش هەبێ.

نارەوەن(( خەندەو بواردن)): نا.. مەرج نەما، دوامەرج ئەوەیە خۆت ئەزانی، تەماشای یەک ئافرەت بە جۆرێک بکەیت، دنیات لێ تاریک ئەکەم ها.؟!!!!!!!!!

دیدەوان: وتم خوایە بڵێ چی؟ لەوەیان هەر تەواو بێخەمبە.

نارەوەن: ئێستا گرنگترین مەرج جێبەجێ بکەو فەرموو بۆ ژووری خۆت.

دیدەوان: جا کەوابێ هەر داوام نەکردیتایە باشتر بوو.

نارەوەن: فەرموو دەی.. دوو مانگی ڕێک نایەیتەوە بەم ژوورەیا.

دیدەوان: نا نا وا نابێ، جاروبار قسەکردن و بەرنامە دانانێک بۆ داهاتوو هەر ئەبێت.

نارەوەن: وەک خوشک و برا.

دیدەوان(( بە ساردیی)): باشششششش دەسەڵاتی زاڵمان نییە!

Cut

دیمەنی – ١١٦٠ – ڕ/د – بەردەرگای نەخۆشخانەی زوبێر:

(( خدر خۆی مشغوڵ ئەكات و پاش كەمێك تریفە لە تەكسیەك دائەبەزێت و باوەشێك گوڵی پێیە، تریفە شەرم و نازو خدریش بە خۆشەویستییەوە پێشوازیی ئەكات.. دیمەنی دوو حەزلێكردە نیشان ئەدرێت))

خدر: ئەوە بۆ عەزێتت كێشا بەقوربان.

تریفە: عەزێتی چی؟ چیمكردوە.

خدر: هاتنی خۆت هەموو شتێكە.

تریفە: شەرم و ناز: زۆر سوپاس.. باوكت لە كوێوەیە؟ با بچین.

خدر: ئەڕۆین.. بەڵام ئەمەوێ بزانم هەر بۆ لای باوكم هاتووی؟

(( تریفە سەری دائەخات و خەندەو شەرم و پێشی ئەكەوێ بۆ ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٦١ –ڕ/د –ناو کارگەی نیگار:

(( شەنیاو سامالّ بە جلوبەرگی جوانترەوەو ڕەمزی پێکەوە وەستاون))

شەنیا(( بۆ ڕەمزی)): خۆم بۆت باس ئەکەم کاکە.. سامالّ یەک پارچە خێرو بەرەکەتە.. ڕوحی بەسەرما دەرئەچێ، (( بە دەم و لێو ئاماژەیەک بۆ ڕەمزی ئەکا بە دزیی سامالّەوە)) من ژێر ئەرزی بۆ ئەگەڕام کەچی وا کەوتە سەر ئەرز.

ڕەمزی: خوا لەیەکتان نەکا.. وتت چی تۆیە؟

شەنیا: کوڕەزای خوشکە گەورەکەی باوکمە.. پورزازامە.

ڕەمزی: نا نا نزیکن.. ئاوەدانیی ڕووی تێکردی شەنیا.

شەنیا: جارێ با بزانم لێرە ئەبێ نابێ، لە چ ولّات و شارێکە.. (( هەڵئەبەزێتەوە)) خەریکە شێت ئەبم لە خۆشیا.

ڕەمزی: ئەگەر لەم شارەیت بە هۆی شەنیاگوڵەوە زوو زوو ئەتوانین یەکتر ببینین.

سامالّ: بە دڵنیایی نیازم وایە ئیتر نەچم بۆ هیچ شوێنێک هەر لێرەبم.

شەنیا(( قیژە)): واو کە باشە.. ئەچین سەری باوکیشم ئەدەین.

ڕەمزی: نا پێویست ناکا، باوکت چی لێ بکا؟ ئەوەتا تۆ هەیت، بەسە.. با هەر نەشزانێ لێرەیە.

سامالّ: بۆ خالّم لە کوێیە؟

ڕەمزی: چۆتە ئەو دێیانە، بەم ئەخیری عومرەوە حەزی لە ژیانی لادێیە.

شەنیا: قسەکەی تۆیە کاکە ڕەمزی.. پێویست ناکا ئەو ببینێ.. با بیبەم توخوا بە نیگار خانیشی بناسێنم.. یارمەتی هەیە دوای ئەوە ئەمڕۆ ئۆف بم و پێکەوە بین؟

ڕەمزی(( سەربائەداو خەندە)): بڕۆ.. بەلّام هەر ئەمڕۆ.. لە بەیانییەوە دوای ئیش یەکتر ئەبینن.

ساماڵ: ئاساییە با بکەوێتە دوای ئیش.

شەنیا: نەبابە توانام نییە تا دوای ئیش چاوەڕێ بکەم، سەرم لێ تێک ئەچێ و یەک ئیش بە ڕاستیی ناکەم.

ڕەمزی: با ئەمڕۆت بۆ کاکە ساماڵ بێ.. میوان ئازیزە.

شەنیا: ئێمە بچین بۆ لای نیگار خان؟

ڕەمزی: فەرموو قوربان، کێ هەیە بتوانێ بڵێ ناچی هههههە.

ساماڵ: زۆر سوپاس.

(( شەنیا دەستی ساماڵ ڕائەکێشێت و پێشی ئەکەوێ بۆ لای نیگار))

Cut

دیمەنی – ١١٦٢ – ڕ/ن – ڕاڕەوی کۆمپانیای ئاوا:

(( لەتیف پیاوێکی تەمەن نزیکەی ٥٠ ساڵان، بە شەرواڵ و کراسەوە، بەرەو ژووری ئاوا ئەچێت.. ڕەوەز بەرەوڕووی دێت))

ڕەوەز: پشکنین هەیە.

لەتیف: ئەزانم ئێستا دێمەوە.

ڕەوەز: دوایی بچۆ بۆ لای، ئیشی پێتە.. باسی شتی بێ سوود نەکەی.

لەتیف: بێسوودی وەک چی؟

ڕەوەز: خۆت ئەیزانی پێویست ناکا.

(( ڕەوەز ئەڕوات و لەتیف وەک ئاماژەی تێنەگەیشتن و دواتر لچ هەڵئەقورتێنێ))

Cut

دیمەنی – ١١٦٣ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ چا تێکردن بۆ یەک دوویەک.. کارە بارێکی پێیەو تێئەپەڕێ))

هاوڕێ: ئەرێ کارە باپیرت چۆن بوو؟

کارە: خوا سەلامەتتکا باشترە مەمنون.

هاوڕێ(( بەدەم چا دانانەوە)): ڕۆڵە ئەم یەک دوو ڕۆژە بە دیاریەوە بوونایە باشتر بوو، ئەو پیاوە تەنیا باڵە.

کارە(( ئەوەستێ)): نا بەدەورییەوە هەن، خۆی ئیزنیداین، وتی بگەڕێنەوە کەسی وای لێ نییە.

هاوڕێ: ئەگەر دەری ناکەن، منیش نیوەڕۆ بە نیازم سەرێکی لێ بدەم.

کارە: وەڵا ئیتر وا جارێ لەوێن نازانم دەرئەکرێ یان نا؟ تەلەفون بۆ مامم بکەی باشترە.

هاوڕێ: وای لێ ئەکەم.

(( کارە ئەڕوات و هاوڕێ بەدیار وجاغەکەوە ئەوەستێ))

Cut

دیمەنی – ١١٦٤ – ڕ / د – بەرکارگەی نیگار:

Mute

(( شەنیا بە هەڵبەزینەوەو کەمێک گورج و گۆڵییەوە بەرەو سەیارەکەی ئەچێت و ئاماژەی سامالْ ئەکات سەرکەویْ، دڵخۆشییەکی زۆر نیشان ئەداو ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١١٦٥ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن خەریکی خۆ کۆکردنەوەیەو دیدەوان دێتە ژوورەوە))

دیدەوان: ها؟ گوڵ بۆ کوێ؟

نارەوەن: ئەچم بۆ نەخۆشخانەکە، سەرێکی باوکی حەمەخدر ئەدەم.

دیدەوان: ڕاستت بوێ شتێک گرێیە لە دڵما ئەمەوێ لە تۆوە بیزانم.. زۆرت دواناخەم، ئەگەر تۆزێ دانیشی.

نارەوەن(( دائەنیشێتەوە)): فەرموو.. هەرچی پرسیارێک هەیە پێش دوو مانگەکە بیکە، بەڕاستی دوای ئەوە یەک پرسیار وەڵام نادەمەوە.

دیدەوان: ئەوەم بە دڵە.. سەبارەت بە حەمەخدر، من ئەزانم میانەتان زۆر گەرمە.

نارەوەن: سەدجارم پێوتووی حەمەخدر ڕێک وەک کوڕی خۆم وایەو.. من هاوکاریی پێگەیشتنیم کردو کردم بەم کورە، لەبەر ئەوەی زۆر بەتەنگمەوە ئەهات.. خوا هەڵناگرێ ئەویش کوڕێکی زۆر بە وەفایە، ئێستا بڵێم بمرە ئەمرێ.. سەرەتا کە ناسیم وەک ئەم هاوکارە داماو بوو.. ماشەڵڵا ئێستا ئەڵێی دانی مارە.. باوەڕکە بەهۆی ئیشەکانییەوە ڕەنگە دەقات زیاتریش خێرم لەدەستی بینیبێ، بەم کۆمپانیایەشەوە کە هاتنی من بەهۆی ئەوەوە بوو.

خدر: کچێ هەر یەکتر ناسینەکەی من و تۆ بایی هەموو ئەوە زیاترە بۆت خەرج کردبێ.

نارەوەن: حەمەخدر داماوە.

دیدەوان: سەری لە چ جۆرە ئیش و کارێک دەرئەچێت؟

نارەوەن: هەموو شتێک، بەڵام یەک کێشەی هەیە هەرچەند ئەمەوێ ئەوەی تیا چاککەم بۆم ناکرێ (( دیدەوان بە ئاماژەی دەم و چاو وەک بپرسێ)) هەتا پێی نەڵێم ئەو ئیشە بکە خۆی نازانێ بیکا.. ئەبێ هەر خۆم ئیشەکە بدۆزمەوە.

دیدەوان: ئۆو زۆر باشە، ڕاست ئەوە نیشانەی داماوییە.

نارەوەن: نا نا یەکجار وا داماویش نییە، هەر ئەوەندەی پێموت برۆ ئەو ئیشە بکە.. ئیتر هەر نازانی چۆن دەستی ئەداتێ و ئەوەندەی بلێی یەک و دوو تەواوی ئەکا.

دیدەوان: لەو جۆرە کەسانە هەن کە هەموو گرفتەکەیان سەرەداوی ئیشێکەو کە دۆزییانەوە ئیتر دانامێنن.. کەواتە کە چووینە ماڵی خۆمانەوە هەر ئێمە بیرۆکەی بدەینێ و ئیتر خۆی ئەڕوا.

نارەوەن: لەبارەی خدرەوە خەمی هیچ شتێکت نەبێ، بە دڵی خۆمان ئەیڕەتێنین.

دیدەوان: ئەی متمانەو دەستپاکیی و لەو جۆرە مەسەلانە؟

نارەوەن: سەری خۆمم پێ سپاردووەو زەرەرم نەکردووە.. با بشزانی دەستی زۆر بە خێرە، لە خۆیەوە دەست بداتە خۆڵ ئەبێ بە ئاڵتون لە دەستیا.

دیدەوان: ئۆو ئەوەش نیشانەی شارەزاییەتی.

نارەوەن: زۆر سەردەرکردووە.

دیدەوان: من و تۆ پێکدێین نارەوەن گیان.. ڕەنگە ئەگەر بمەوێ ئیشێکیشمان بۆ بکا هەر لەڕێگەی تۆوە بێت باشترە، ئێوە زۆر تێکەڵترن و ڕەنگە بۆ من بەو هەموو دڵسۆزییەوە نەیکا.

نارەوەن: یەکەم بڵێ نارەوەن خان نەک گیان.. دووەمیش کە گەیشتینە سەر ئەوەی ئیشی پیادابەین، خوا کەریمە.. هەمووی هەر خۆم ڕێکی ئەخەم خەمت نەبێ.

دیدەوان: ئا ئا دواپرسیار.

نارەوەن: فەرموو.

دیدەوان: هیچ هەست ناکەی پشتێکی هەبێ، یان لە ئەفسەرێکی خزمییەوە نزیک بێ، یا.... کچێ چوزانم ئەڵێم نەک ئیشم تێبکەوێ.. جاری وا هەیە لەسەر ئیمزایەک لەبری کەسێکیتر بیکەی، ئەتهێننە گیروگاز.

نارەوەن(( پێکەنین)): حەمەخدرو ئەو شتانە؟! هههه کورە من پێت ئەڵێم خۆم لە حەماڵییەوە کردم بە خاوەنی چارەکی کۆمپانیا.. ئێستا ئەوەی لێ بسەنمەوە، مەگەر ئێوە فریای بکەون، ئەگینا لە برسا ئەمرێ.. تازە فێری شت بووە، حەماڵییەکەشی بۆ ناکرێ هههه.

دیدەوان(( خەیاڵکردن و لەبەرخۆیەوە)): ئءهـ ئێ.. ئەوەشم زۆر بە دڵ بوو.. پێش هەموو شتێک ئەبێ ناچار بکرێ ئیش بکا.

نارەوەن: بەڵێ؟؟؟؟؟؟؟!!. ناچاری چی؟ من چۆن ئەهێڵم پەکی بکەوێت، ئەو سەرچاوەی ڕسقی منە.

دیدەوان: هیچی نییە لەم کۆمپانیایە؟

نارەوەن: وا کۆمپانیا ئەبێ بە هی من؟ خۆ نایکەی بە شەریکە بەشم ئیشەڵڵا؟

دیدەوان: هههه پرسیارم نەما.. بەڵام دواتر پێکەوە ئیشی لەسەر ئەکەین و ئەیخەینە ئیشی زۆر گەورەوەو ئێمە بەس داهات بچنینەوە.

نارەوەن(( هەڵئەسێ)): ماڵی گەورە، داهاتی گەورە ڕائەکێشێ.. خەمت نەبێ خۆشم ئیش ئەکەم، بۆ هەر حەمەخدر؟.. با زۆرەکەش بۆ خۆمان بێ.

Cut

دیمەنی – ١١٦٦ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان و کلۆپەو باڵا ))

تافان: دەی یەک یەک بچن خۆتان بشۆن.

باڵا: ئەم بەیانییە خۆمان شت خۆ خان نییە؟

تافان(( ئەچێ گوێی ڕائەکێشێ)): وتم خۆت بشۆ یەعنی خۆت ئەشۆی، تاقەتی بەزمی باوکە حەیابەرەکەتانم نییە.

کلۆپە: کەی باوکم هەقی بەسەر خۆشتنی ئێمەوە هەیە؟

تافان(( دێت بۆی و کلۆپە ڕائەکا، باڵا پێئەکەنێ)): کوڕی نازانم چییەکە، ئەمڕۆ پیرەمێردەکە ژن ئەهێنێ.. یەک لاروخوارییمان هەبێ، باوکتان ئەمکا بە فلیم.

باڵا: مامە زوبێر ئەڵێی؟ جا کوا پیرە؟ بۆ پێی ئەڵێی پیرەمێرد؟

تافان: ئەی خۆ نۆفیکەڵانەو جوان و جحێڵیش نییە مەیمون.

باڵا(( بە گاڵتەوە ئەگری)): شەرت بێ بە باوکم بڵێم دایکم پێم ئەڵێ مەیمون.

کلۆپە: منیش شایەتم. هههە.

تافان: چاوی هەردووکتان دەرئەهات.. شەرت بێ منیش پێی بڵێم خۆتان ناشۆن.. ئەوە ئیتر من هەقم نییە، با بێتەوە بتانکوتێ.

باڵا: دە باشە ئیتر.. وا من ئەچم.

کلۆپە: نەخێر خۆم ئەچم من گەورەترم.

تافان(( تورە)): دەی یەک بخۆن!! بزانم کامتان ئازاترن.

Cut

دیمەنی – ١١٦٧ – ڕ/ د – پارکێک:

(( شەنیاو سامالْ ))

سامالْ: قەت لەو باوەڕەدا نەبووم، کچێکی وەک تۆ ئەوەندە زۆرزان بێ (( ئەکێشێ بەسەری خۆیا )) ئاە؟ باوکەڕۆ چیتکرد چیتکرد؟!

شەنیا: ئەوەش نەبووایە هەر نەمئەتوانی یەک چرکەش بتبینم.. ئێستا هەندێ شتت پێ ئەڵێم ئەبێ ئەوە بکەی، ئەگینا وەک ئەڵێن ڕێسەکەمان ئەبێتەوە بە خوری.

سامالْ: ئەوەی لە تۆم بینی، بەسە بۆ ئەوەی هەرچی بڵێی ئەبێ ئەوە بکەم.

شەنیا: یەکەمین شت بۆ ماوەیەک بە هیچ جۆرێک ناچیتەوە ماڵی خۆت.

سامالْ: ئەی بچم بۆ کوێ؟

شەنیا: تۆ گوێ بگرە.. من ئەمەوێ پێکەوە بگەینە ئەو کەسەی دەستی چووە ڕامالْ، پێموتی کە پێش ئەم ژنەی چەند منی خۆشویستووە، لەبەرئەوە من هەموو شتێک ئەکەم بۆ دۆزینەوەی بکوژەکەی و گەیاندنی بەسزای خۆی، لە تۆش زیاتر مەبەستمە.

سامالْ: زۆر سوپاس ماڵت ئاوا بێ، خوا بکا بۆمان بکرێ.. نەتوت بچم بۆ کوێ؟

شەنیا: سەرەتا وەک کەسێک لە هەندەران هاتبێتەوە، ئەچیتە ئوتێلێک و بۆ یەک دوو ڕۆژ دوای ئەوە خانویەکی جوانت بۆ ئەگرم لە دەوروبەری خۆم.. ئەبێ ئەوە نیشان بدەین کە زۆر بەڕاست من و تۆ بە یەکتر بینینەوە زۆر دڵخۆش بووین.

سامالْ: ببورە بەڕاستی من ئەوەندەم نییە ئاوا بە ئیسراحەت پێی بژیم و دوای بکوژی براکەم بکەوم.. باوەڕکە ئەگەر ڕۆژێک نەچم بۆ ئیش زەحمەتە.

شەنیا: کێشەی پارەت نەبێ زۆرە پەکمان ناکەوێ.. هەمووی لەسەر من، وەک وتم زۆرم مەبەستە بە بکوژەکەی بگەین.. ئەوەی ئەیڵێم ئەوە بکەو ئیتر هەقی هیچت نەبێ ناهێڵم گیرفانت چۆڵ بێ.

ساماڵ: من باش لە چیرۆکەکە حاڵیی نیم، بۆ ئەبێ خۆمان بە جۆرێکیتر بۆ خەڵک دەربخەین؟

شەنیا: لەبەرئەوەی کە زانرا برای ڕاماڵیت، تۆش توشی مەترسیی ئەبیت، یان بەلانی کەمەوە هیچت دەستناکەوێ.. ئیتر پرسیار مەکە هەموو شتێکت بۆ ڕوون ئەبێتەوە.

ساماڵ: باشە من بەس گوێت لێ ئەگرم.

شەنیا: شوفێریی ئەزانی؟

ساماڵ: بەڵێ.

شەنیا: زۆر باشە، ئەبێ سەیارەت هەبێ.. ئەمشەو دێیت بۆ ماڵەوەو ڕێکی ئەخەین.. جلوبەرگی زۆر نایاب ئەکڕی، بۆنی خۆش، مۆبایلی باش، سەعاتی مارکە.. هەموو شتێکی باش.

ساماڵ: ئای خوایە!! ئەم هەمووە بۆ؟

شەنیا: تۆ ئەبێ بە کەسێتییەکیتر بێیتە ناو یارییەکەوە، تا بە وریایی خۆت بکوژەکە ئەدۆزینەوە.. ئەو خوێنە نابێ بەفیڕۆ بڕوا کاکەبرا.

ساماڵ: ئەی دواتر؟

شەنیا: تۆ زۆرت پەلەیە.. ئەتەوێ لە ئێستاوە ئەوسەری پلانەکە بزانیت.. وا نابێ.. ئەوەی ئێستا لەسەرتە، ئەوەیە خۆت بەوجۆرە دەربخەیت کە باسمان کردو ماڵی باوک و کەس و کارو هەموو شتێک بیری خۆت ئەبەیتەوە.. ئەمەت پێ ئەکرێ؟ یان وازی لێ بێنین.

ساماڵ: باشە هەوڵ ئەدەم.

شەنیا: کوڕی ئاسمانەکە هەوڵ نییە.. بە یەک هەڵەی بچووک ژیانی خۆت دائەنێیت و هی منیش، هەوڵی چی؟ هەڵە قەدەغەیە.

ساماڵ: ئەی ناوەکەم؟

شەنیا: ناو چییە؟ هەزاران کەس ناویان سامالە.. خۆم لە ماڵەوە بە سکاین و پرینت ناسنامەیەکت بۆ دەرئەکەم ناوی باوکت ئەگۆڕم.. ئەوپەڕەکەی تۆ تەنها ئەوانی پێ بەڕێ ئەکەی، خۆ ئەوانیش حکومەت نیین بزانن ساختەیە، هەقی ئەوانەت نەبێ.

سامالْ: ئەوەی تۆ کە ئەڵێی ئەوان، یەعنی زۆرکەس لە پشتی کوشتنەکەوەیە.

شەنیا(( بێحەوسەڵە)): ئەرێ کاکە تێبگە، براکەم تێبگە.. لە من بترازێ هەموو کەسێک ئەوانە.. کاشکای پێش تریفەو تیرۆژیش تۆم ببینیایە، باشتر ئەبوو ئەوانیش نەزانن.. بەهەرحاڵ خۆم ئەوان ڕایی ئەکەم و تۆش بە هیچ جۆرێک ناچیتەوە بە لایانا.

سامالْ: وا ئەکەم.

شەنیا: ئینجا پێت بڵێم چی ئەکەی؟ باش گوێبگرەو تێبگە!

Cut

دیمەنی – ١١٦٨ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی نیگار:

(( نیگار لەبەردەرگایەو نازەو ڕێژوان و سەلوا میوەو شیرینیی لە سەیارەکەی زوبێر دائەگرن کە بە ڕێژوانە))

ڕێژوان: باوکم بە منی سپاردووە دایەگیان، چیتر پێویست ئەکا؟ بیرم بخەرەوە، توخوا با هیچ کەم نەبێ.

نیگار: لەوە زیاتر چی ئەهێنی؟ هەمووی بە زیادەوە هاتووە کوڕم.

سەلوا (( بۆ ڕێژوان)): گۆشت و مریشکەکەت بیرچووە.

نیگار: کچێ گۆشت و مریشکی چی؟ نازە هەموو شتێکی ئامادەیە ڕۆڵە، هیچ نەهێنن.

نازە: نەکەن هەرچی بێنن خەسار ئەبێ، زۆرم داناوە لێی بنێم.

ڕێژوان: یەعنی ئیشی من تەواو.

نیگار: لەشت ساغ بێ بە قوربانت بم، تەواو..

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی سەلواو ڕێژوان))

Cut

دیمەنی – ١١٦٩ – ڕ/ن – دوکانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان لەبەر ئاوێنە بە موکێش خەریکی دەموچاویەتی و گۆرانی ئەڵێ.. گوڵزارو زاهید دێنە ژوورەوە.. ))

گوڵزار: ئەوە چییە دەم و چاو ئەڕنیتەوە؟

ئەردەڵان: نا بەساقەوبم ئەمەیان دەم و چاوم نییە، گوێ و ڕوومەتمە.

گوڵزار(( پێکەنین)): ئەها زاهید نەموت پیاوێکی زۆر قسەخۆشە.

(( ئەردەڵان دێت و بە گەرمیی بەخێرهاتنی ئەکاو تعاروف.. زاهید خۆی بە گێژولکە نیشان ئەدا))

زاهید: ئەگەر بەیانی دێین یان نایەین؟

ئەردەڵان(( سەرسوڕمان)): چۆن چۆن؟

زاهید: ئەگەر ئێمە دێین تۆ دێیت و ئێمە ناچین تۆ نایەین.

ئەردەڵان(( بۆ گوڵزار)): بەیانی ئەچین و ئەمەمان لەگەڵ ئەبێ؟

گوڵزار: بەڵێ، زاهید زۆر عەجیبە، لەو ڕێگەیە هەر پێئەکەنین بۆ خۆمان، شتی وا ئەڵێ ئەقرتێی.

زاهید: من لەگەڵ ورگی شلی وا ناچمە سەیارەی ئەوەوە، دەستی ناگاتەوە پێڵاو هەڵکێشێ چاوی قەوس ئەبێتەوە.

ئەردەڵان(( پێکەنین)): عاجەباتییە!!! بۆ من باشە.

زاهید: پرسیار لێت بکەم؟

ئەردەڵان: ئەی فەرموو؟ (( گوڵزار هەر پێ ئەکەنێ))

زاهید(( ئامارژەی سینییە پاقلاوەیەکی بەتاڵ ئەکا)): لەم سینییە پاقلاوەیەت ٨ پاقلاوە لەم ڕیزە سیانیان ئەڕژێ، لەو ٨ پاقلاوەیەی ئەوبەریش هیچیان نارژێ، من دووان

ئەخۆم، سیانیش ئەدزم، لەم دوانزەیەی خواریشەوە گوڵزار حەوتیان ئەخوا پێنج دانەش مشک بەسەریا ڕۆشتووە.. ئەم سێ سەرەمقەستەش خۆت فڕێی ئەدەی.. چەند پاقلاوەت بۆ ئەمێنێتەوە بیفرۆشی؟

ئەردەڵان: باوەڕ ناکەم بتوانی پرسیارەکە دووبارە بکەیتەوە.. بەڵام ئەوەندە تێگەیشتم گوڵزار گیان حەوت پاقلاوەی بۆ ناخورێ بە جارێ.. ئەوە تەرککە (( بە دەنگی بەرز پێئەکەنێ))

زاهید: بە چێ پێ ئەکەنی هەزەلی، ئەو سینییە پاقلاوەی تیا نییە.

(( پێکەنین))

زاهید: ببورە سوعبەتمان کرد.. بەیانی ئامادەبە، شەبەقیی لێرەوە دەر ئەچین.. دێینە ئێرە بە شوێنتا.

Cut

دیمەنی – ١١٧٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو نینا دێنەوە ))

ئاوا: تۆ بچۆ ژووری خۆت کەمێک ئیشم هەیە.. ڕەوەزم بۆ بانگکە.

نینا: باشە. (( ئەچێتە دەرەوەو پاش کەمێک ڕەوەز دێت ))

ڕەوەز: فەرمووو!

ئاوا(( کەمێک خۆبادان لەسەر کورسییە دەوارەکەی)): ئەزانی ڕەوەز من هیچ کێشەم نییە لەگەڵ ئەوەتا کە بۆ خەڵک زۆر چەنە ئەدەیت و لەگەڵ منیشا بە یەک وشە وەڵام ئەدەیتەوە؟ ئەوە پەیوەندیی بە میانەی نێوانمانەوە هەیە کە خراپە.

ڕەوەز: من وا حەزم لێیە.

ئاوا: ئێ ئێ خۆ خراپم نەوتووە، وتم کێشەم نییە.. بەڵام کێشەی ئەوەم هەیە حەماڵی تایبەت بێنیت و باری ئێرە بخەیتە سەیارەی خۆتەوە.

ڕەوەز: شتی وا نەبووە.

ئاوا: کامێرا چاودێرییەکانی دەرەوەو ناوەوە، هەمووی بە ئینتەرنێتەوە بەستراونەتەوە.. لە میسرەوە ئاگام لە هەموو جوڵەیەکی ناو کۆمپانیاکە بوو.. بەڵێ لەوەش ئاگادارم لەتیف بە دیار بارەکەوە بۆ پشکنین وەستابوو، دەرتکردو نەتهێشت بیپشکنێ.

ڕەوەز: درۆ ئەکا.

ئاوا: چیە چیی تۆو حەماڵەکەی کە کردت بە شیرینیی فرۆش و هاتوچۆی ئەو کچە بێچاو و ڕووەکەشم بینی بەردەوام لێرە کەوتبوو.

ڕەوەز: هەر کەس پێیوتووی ڕاست ناکا، ئەیەوێ بەینمان تێک بدا.

ئاوا: ئەو ڕۆژەی پەلامارە ئابڕووبەرانەکەشتان دروستکردو هێناتانە ژوورەکەی منەوە، تەنها بۆ گواستنەوەی دوو کارتۆن بوو لە ژوورەکەی تۆوە بۆ ناو سەیارەکەت.. تۆ بیرت چۆتەوە کامێرا دانراوەو هەمووشی تۆمار ئەکا با بزانی.

ڕەوەز: پێداویستیی خۆم بوون.

ئاوا(( هەڵئەسێتە سەرپێ و جدیات و تحدي)): ڕەوەز گوێ بگرە.. تۆ لەگەڵ کەسێکی سادەیا هەڵس و کەوت ناکەی، ئەوە بزانە.. من کوڕی دارەوانم دارەوان، هیچ بەسەر منا تێپەڕ نابێ.. ڕاستە خۆم بێ ئاگا نیشان ئەدەم، بەڵام ئەوە بۆ تێرکردنی دەبەنگیی تۆ بوو، تا بە پێی خۆت بکەوێتە تەڵەکانمەوە.

ڕەوەز: جنێو مەدە.

ئاوا: جنێو ئەدەم و هەردوو چاویشت دەرئەهێنم.. ئێستا ئەو تۆمارکراوانە بدەم بە پۆلیس و توشی ڕۆژی ڕەشی خۆتت بکەم؟.. وای لێهات کۆمپانیای من بۆ تلیاکچێتیی بەکاربێنی سەخیف.

ڕەوەز: ئیشی تلیاکم نەکردووە.

ئاوا: ئەڵێم خوایە ئەوەی لەوێوە بینیم هەر شەش حەوت بار بوو، کەچی زیاتر لە پەنجا بارت بۆ من ڕیز کردووە تا لێت ڕازیی بم، هەمووشی لە پارەی تلیاک.. قەیچێکا ڕەوەزی ناموبارەک، با پارەی تلیاکمان دەرخوارد بدەیت.

ڕەوەز: تۆ هەر لە مناڵییەوە بە پارەی تلیاک بەخێوکراوی.. ئێستا یەعنی چی بە خراپی ئەزانیت ئەهـ ئەهـ

ئاوا(( تورەو تەقینەوە)): بۆ دەرەوە خوێڕی هیچ و پووچ بۆ دەرەوە.

(( ڕەوەز ئەچێتە دەرەوەو نینا بە ڕاکردن و شڵەژاویی دێتە ژوورەوە))

نینا: ئەوە چی بوو ئاوا گیان؟!!!!!

Cut

دیمەنی – ١١٧١ – ش/ د – ماڵی نارەوەن:

(( لە باخەکەدا نارەوەن و هەرمێ و سۆماو گێلاس وەستاون تەواو خۆیان ئامادە کردووە بۆ حفلة، حمە خدر دێت و ئاواو نیناش بە هەمان شێوە خۆ ڕازاندنەوەو تریفە لە مدخلەوە دێتە دەرەوە، خدر دوور لە چاوی ئەوان تەماشای ئەکات و (( واو)) .. تریفە زۆر خۆی ڕازاندۆتەوەو جلوبەرگی ئاهەنگی شەوانەی لەبەردایە، سەرشان ڕووت. هەرمێ ئەچێ بۆ لای))

ئاوا: هههە وەڵا تریفە قەت نەمزانیوە ئەوەندە جوانی هههەه.

تریفە: جا کوا چیمکردووە؟

هەرمێ: لە هەرهەمووەمان جوانتری ئەی بۆ خۆت ئاشکرا ناکەی دادە.

نینا: واو بەدڵمە.

گێلاس: خوا لە ناوی دەمی ئەو کابرایە با یاخوا، ئەگینا تریفە هەر دەستەگوڵی گەڕەک بوو.

خدر: کێ ماوە بێت؟ درەنگ نییە؟

Cut

دیمەنی – ١١٧٢ – ش/ د – کۆڵانێک:

Mute

(( مام لەتیف لۆژەلۆژ بە پێ بەرەوماڵەوە ئەڕواتەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٧٣ – ش/ د – بەردەمی ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان و کڵپەو باڵا دەنگە دەنگی دەستکەوتنی تەکسی و درەنگەیانەو تەکسی دێت و ڕایئەگرن و سەرئەکەون))

Cut

دیمەنی – ١١٧٤ – ش/ د – بەر دوکانی شیرینیی:

(( ڕەوەزو ئەردەڵان وەستاون))

ئەردەڵان: باشە ئێوە ئەو هەموو پارەیە لە کوێ ئەهێنن ئەی هاوار؟ پارەی دوکانەکەشم بدەیتێ و جارێکیتریش بمدەیتەوەو قازانجیشی هەر بۆ خۆم بێ؟ ئاخر چۆن دەری ئەهێنێ بۆت.

ڕەوەز: تۆ چۆنت پەیا کرد ئێمەش هەروا.. ئەوانەت هەموو ئەدەمێ کێشەت نەبێ.. ئەگەر ئەملاولات بوو بچۆ، من لێرەم و لێرەش بیت ئەوا ئیتر بە هەردووکمان ئەیگێڕین.. کلیلەکانیش یەکیان لای من بێ و ئەویتریش بە تۆ بێ.

ئەردەڵان: هەروا ئەکەین.. بەڵام بەخوا ئەترسم ئەو هەموو پارەیەم سەرم بخوا، قەت ئەوەندەم بەخۆمەوە نەبینیوە.

ڕەوەز: فشەیە گوێی مەدەرێ، با ئەمساڵ بمرین دەساڵیترو بیستیتر نەبێ، فەرقی چییە؟

ئەردەڵان: کورە زۆری فەرقە کاکە ڕەوەز من تا ئێستا خێرم لە ژیانی خۆم نەدیوە.. ئاخر دوایی کە مردم خۆ زیندوو نابمەوە بێم ئەوی ماوەتەوە بیخۆم.. هەر یەکجارە برا.. توخوا با تێری لێ بخۆم و زۆریش بژیم.

ڕەوەز: باشە باش.. خەمت نەبێ من لە پشتتم، زۆر ئەژیت.. ئەگەرێمەوە نەڕۆی! (( ئەڕوات))

(( ڕوخساری ئەردەڵان دیارە قەناعەتی نەکردووە))

Cut

دیمەنی – ١١٧٥ – ش/ن – ماڵی نیگار:

(( دیمەنێکی سەربەست لە مارەبڕینی نیگارو سەماو پیرۆزبایی، دایالۆگ لە مەراسیمەکە دەرنەچێت..

ئامادەبووان:

زوبێرو نیگار بوک و زاوان.. دەوران، نارەوەن، حەمەخدر، ئامۆ، ئاوا، نینا، هەرمێ، گێلاس، ئاکۆ، تیرۆژ، تریفە چاوبازیی لەگەڵ خدر، ڕێژوان و سەلواو بروسک و چیمەن، هەندرێن و تافان و کلْپەو بالا، خدرو هەرمێ زوو هەڵئەسن بە بیانووی چوون بۆ لای باوکیان))

Cut

دیمەنی – ١١٧٦ – ڕ/ن – قاوەخانە:

(( شەنیا بە تەنها دانیشتووەو چاوەڕوانەو تەماشای سەعات ئەکا.. پاش کەمێک ساماڵ بە بۆینباخ و قاتی شیک و سەری ڕێکخراوی مۆدێلەوە دێتە قاوەخانەکەوە ))

شەنیا: یەک هەڵەیەک ڕوویدا.

سامال: خێر چیمکردووە؟

شەنیا: ئەم شێوەو ڕوخسارەی ئێستاو ئەوسات، لە دوو کەسی جیاواز ئەچێ.. یەکسەر ئەزانرێ بۆ مەبەستێک دەسکاری کراویت.

سامال: خۆت وتت وا بکە.. هیچی زیادەم نەکردووە.

شەنیا: ڕاستە، نەمئەزانی وا ئەکەوێتەوە.. کێشە نییە چارەسەری ئەوەش ئەکەین.. ئەڵێم هاتبۆوە تاقەتی هیچی نەبوو، مۆڵێ پارەشی پێیە، نەیئەزانی مۆدێلی ئێرە چاولێکەریانە زۆر ڕۆشتووە.. ناردم تەواو دیزاینیم گۆڕی.

سامال: خۆت حەکیمی!!

شەنیا: ئاوا لە بەنیایەمێکیتر ئەچی..

سامال: دەی بە حسابی خۆم بەیانیی زۆریش خۆم سەغلەت کردبوو.. بەس تۆ زەوقت جوانە.. ئەو قات و کراس و بۆینباخە تەقاندوێتی.

شەنیا: خۆ لە بازاڕ دانەنیشتووی ئەڵێی تەقاندوێتی.. ئەو وشەیە لە فەرهەنگتا ئەسڕیتەوە.

سامال: ئێهـ ئەڵێم جوانە.

شەنیا: شیکە.. زەلام.. شیک.

سامال: بەڵێ شیکە.

شەنیا: ئەبێ زۆر پەلە بکەین.. ئەمشەو شێوازی قسەکردن و زاراوە زەقەکان و ئسوڵ و ئەتەکێتی ئەو جۆرە شوێنانەت پێ ئەڵێمەوە.. هیچ نییە فشەیە.. تۆزێ خۆ هێنانەوە یەک و ئاگا لەخۆ بوونی ئەوێ.. سادەییەکەت هەڵگرە بۆ گەڕانەوەت.

ساماڵ: ناخم زۆر شێوا شەنیاخان.. هەست ئەکەم تۆپەڵێک گەچ بەسەر سەرمەوە وشک بۆتەوە.

شەنیا: هههه توخوا ئەوە نمونە بوو هێناتەوە؟

ساماڵ: ئەی تۆ ناڵێی شت بچوێنە بە شتێکیتر.. ئێ گەچ کە گیرایەوە زوو ڕەق ئەبێ.

شەنیا: ساماڵ گیان من کاتی ئەوەم نییە لەسەر وردو درشتی شتە هەبووەکان قسەت بۆ بکەم.. هەر نمونەو لێکچوواندنێک سەر بەو جیهانەی خۆت بوو کە تیا ژیاوی، نابێ بیهێنیتەوە.. نمونەی ژیانیی ئێستام ئەوێ.

ساماڵ: دەی منیش ئەوەیان نازانم.. گوێ بگرە پێم بڵێ کێیە ئەگەر ئەیزانی ئەچم ئەیکوژم و ئیتر ئەم هەموو گێچەڵەی ناوێ بە منی ئەکەی.

شەنیا: لەسەرخۆ، لەسەرخۆ کاکە.. بمزانیایە، پێویستیی بەوە نەئەکرد تۆ پێم بڵێی، خۆم پێم ئەوتی.. ئەم هەموو گێچەڵ و سەرێشەیەی باسی ئەکەیت بۆ دۆزینەوەی بکوژەکەیەو ئاسانیشە زوو لەسەری ڕایەیت.. بە هێمنیی دیقەتی قسەکانم بدەو زەخت لەخۆت مەکە.. هەرچی تێنەگەیشتی پێم بڵێ.

Cut

دیمەنی – ١١٧٧ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان و ڕەمزی دانیشتوون))

دیدەوان(( پێکەنین)): پولەکێتییەکەی لە ئەقڵا نییە، پارەپەرستی وام بە ژیانم نەبینیوە.. باوەڕ ئەکەی ئەمڕۆ حسابی زۆر بچوکی لەگەڵ چایچییەکەیا ئەکرد، کە خۆیشی داینا‌وە، هەر خەریک بوو دەریکا، من نەمهێشت.

ڕەمزی: دارەوانیش زۆرجار باسی ئەوەی ئەکرد، ئەیوت سەرباری ئەو هەموو پارەیە، چاوی لەدوای جگەرەی من بوو تا تەرکم کرد هههە.. گرنگ ئەوەیە ڕازی بوو و ئیتر سەروەختی ئیشی گەورە دەست پێ ئەکەینەوە.

دیدەوان: ئەبێ تەلارو کۆمپانیا بکەم بە ناوی خۆیەوە ئەوسا هههە ئینجا شتێکی زۆر سەیر.

ڕەمزی: ئادەی.

دیدەوان: زۆر خراپ لە میانەی نێوان و ئەو و خدر تێگەیشتبووین.

ڕەمزی: چۆن؟

دیدەوان: وا دیارە خدر خراپ نەبێ، بەڵام بۆ ئەم ژنە موسەخەر بووەو بە ئارەزووی خۆی ئیشی پێ ئەکاو پارەی پێ پەیا ئەکا.. ئینجا منەتیشی بەسەرا ئەکا، ئەڵێ هەرکاتێ چارەکە کۆمپانیاکەی لێ بسەنمەوە لە برسا ئەمرێ، هیچی نییە بیخوا.

ڕەمزی: ساختەچییە کلکی خستۆتە مشتیەوە.

دیدەوان: بیرێکم لەوە کردەوە ئەگەر خۆمان خدر بەکاربهێنین و لەژێر ڕکێفی ئەو دەری بێنین چۆنە؟

ڕەمزی: نا من پێم باش نییە، بە لانی کەمەوە با هەر نارەوەن چۆنی لێخوڕیوە، هەروا ئیش بۆ ئێمەش بکا.. ئەوە ناڵێم دوای چەند ئیشێکی گەورە بیهێنینەوە.. تۆ ئەگەر ئیشت بە نارەوەن نەمێنێ چی لێ ئەکەی؟ وەک دارەوان ئەیکەی بە شاژنی ماڵت؟

دیدەوان: ناوەڵا ئەیکەم بە قەزاوەگێڕی یەک فیشەک، من ئەو پیرێژنەم بۆچییە؟

ڕەمزی: دەی کەواتە لە ئێستەوە با چڕتر ئیش لەسەر خدر بکەین و لە ئیشا بیگەوزێنین.. تۆ بڵێی پشت نەکاتە نارەوەن؟

دیدەوان: کە باسی ئەوەمکرد خدر ئیشمان بۆ بکا، وتی خۆم ئەیکەم.. کورە باوکی خدریش ئەکا بە قوربانی دۆلارێک.. ئەوەم زۆر پێباشە بۆ هەڵگەڕانەوەی خدر لە نارەوەن.

خدر: من هیچ گومانێکم لەوەیا نەماوە خدر لە هەموو ئەوانەی لای خۆمان باشتر ئەبێ.. بەڵام ماڵوێرانە درەنگ خۆی ئەدا بەدەستەوە.. بەو قسانەی تۆ بێ، ئەبێ چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ بکرێ و ئەو منەتباری بێت.. دیارە بەوە دێتە ژێربار.. ئەگینا نە پارەو نە ئافرەت کاری تێ ناکەن.

دیدەوان: ئەی ئەو چەتیوەی سەرچڵەکەت دەستی پێکردووە؟

ڕەمزی: نا.. یەک دوو ڕۆژیتر، بەڵام وەک تۆ ئەڵێی هیچ بە هیچ ناکا.. ئەی ئاگات لێیە؟

دیدەوان: لە چی؟

ڕەمزی: ئەمڕۆ بە یەکەوە هەردوو ژنەکەی دارەوان شوو ئەکەنەوە.. ئەوە تۆ ئەویانت داگیر کردو ئەویتریشیان ئێستا لە ماڵەکەیا شایی لۆغان و مارەبڕینە.

دیدەوان(( پێکەنین)): وەڵا وایە بەختیان کراوەتەوە.. ئەی چۆنە تۆ نەچووی؟

نیگار: پێیوتم.. بەڵام ئەزانێ شەوان ناچمە دەرەوە، زۆری نەکرد.. بە کەڵکی ئێمە نایەت ناسیاو بۆ خۆمان زیادکەین.

Cut

دیمەنی – ١١٧٨ – ش/ن – ژووری نەخۆش – نەخۆشخانەی زوبێر:

(( حەمەخدر زەرفێکی پڕ پارەی بەدەستەوەیە.. بەدیار باوکییەوە))

خدر(( زەرفەکە ئەداتەوە بە هاوکار)): بڵێ ماڵیان ئاوا بێ، کاک ئامۆو کاک زوبێر هیچیان وەرنەگرت و خستیانە ئەستۆی خۆیان.. سوپاس و پێزانینی زۆریان بکەو بڵێ هەڵوێستەکەتان هەموو شتێک ئەهێنێ.

هاوکار: خۆ کاک ڕاهۆز وتی وەرینەگرێ، بەڵام وتی تۆ نەیهێنیتەوە.. پارەی خۆمانە وەک برادەران و هەندێک هاوکاریش.

خدر: ئەزانم باوە گیان، ئەوە پەیوەندیی بە تۆوە نییەو عاجزت ناکا دڵنیابە، خۆی باشم ئەناسێ.. پێی بڵێ ئەگەر هەرچییەکی تێچووایە، ئەوەم هەڵئەگرت.. بەڵام هیچم خەرج نەکردووە دڵنیابن. ئەرکیش ناخەمە سەر کەس و هاوکاریشم پێ ڕەوا نییە.

هاوکار: بەڵێ باشە لە خوارەوە چاوەڕێمە با زوو بگەڕێمەوە لای.

خدر: باشە چاوەکەم.. زۆر ئاگات لە نارەوەن بێ.. ئافەرین خۆت ئاشکرا نەکردووە.

هاوکار: بەڵام هەرچی لەوناوە ڕووبدا پێی ئەڵێم، کاک ڕاهۆز وایوت.

خدر: ئا ئا ئاگام لێیە باش ئەکەی، ئەوەی گوێگرتنەکەشی بۆ گێڕامەوە.

هاوکار: خەمت نەبێ لەچاوم زیاتر ئەیپارێزم.

(( چونە دەرەوەی هاوکار))

Cut

دیمەنی - ١١٧٩ - ڕ/ د - سەیرانگە:

(( زاهید گۆشت برژاندن و گوڵزارو ئەردەڵان یاری بە ئاوەکە ئەکەن))

زاهید: چەند شیمانتر، بۆ ئێمەش تائەو بۆ ئاگرەکە؟

ئەردەڵان: من یەک شیشیتر ئەخۆم.

زاهید: پێمناخۆشە، باش فێری زمانەکەم بوویت.

ئەردەڵان: ئاخر من ئەبێ بە پێ هەڵتەک هەڵتەک ئەو شاخ و کێوە بگرمە بەرو ئێوەش بۆ خۆتان بە هەوای شان و باڵ بەسەیارەی خەت دێنەوە.

گوڵزار: ئێ چی بکەم گیانەکەم؟ بەخوا سەیارەکە پەکی نەکەوتایە، تا شار هەر بە پێکەنین و فشقیات بەڕێمان ئەکرد.

ئەردەڵان: دەی با ئەم قوزەڵقورتەتان نەهێنایە کە ئەتانزانی سەیارە تەواو نییە.

گوڵزار: قوزەڵقورتم بۆ ئەوە هێنا میزاجمان باش بێ و چێژ لە دیمەنەکان وەرگرین.

ئەردەڵان: بۆ ئەوە شەش کیلۆی ئەوێ؟

زاهید: نا.. وتمان ئەگەر پارەمان لێبڕا لێی ئەفرۆشینەوە.

ئەردەڵان: یەعنی پۆلیس بمگرێ چیم لێ ئەکا؟

زاهید: هیچی وا نییە، ئەتکەن بە نیشانەو هەموو پۆلیسەکان تەقەت لێ ئەکەن.

گوڵزار: نا نا گاڵتە ئەکا.. تۆ خۆت مەدە لە شوێنێک پۆلیسی لێ بێ، ئیتر هیچ ڕوونادا بەساقەی دڵت بم.

ئەردەڵان: ئاخر بەخوا زۆر دوورە.

زاهید: بە پێ زۆر هاتووم، هەمووی شەش سەعات بۆ شەش و نیوە، بەڕاستی زۆر نییە، هەم پیاسەیەکیشە بۆ خۆت ئەیکەی.

ئەردەڵان: ئەی بۆ تۆ پیاسەکە ناکەیت و من و گوڵەگیان بە سەیارەی خەت بڕۆینەوە.

زاهید: گوڵە بە من سپێرراوە ناتوانم جێی بهێڵم بەرپرسیارێتییە بەساقەوبم، ئەگینا حەزیشم ئەکرد.

گوڵزار: تۆ شیشێکی بۆ بێنە با خۆم بیکەم بە دەمییەوەو ٤ شیشیتریشی بۆ ڕێگا بۆ بپێچەرەوە نەک برسی بیت.. ماشەڵڵا لەو ورگەی(( دەست لە ورگی ئەدا)) بە چی تێر ئەبێ؟ هههە.

ئەردەڵان: بەخوا گوڵە گیان لەبەر خاتری تۆ بڵێی سەد سەعاتیش ئەیبڕم بە پێ، با منیش لە نیوەی ڕێ گیانم دەرچێ.

گوڵزار: نا خوا نەکا دڵەکەم.. ئەی ئێمە بە کێیا شت بنێرینەوە ئەگەر پەکمانکەوت.

ئەردەڵان: ئەی وایە، خوا بارگیرێکی وەک منی بۆ موسەخەر کردووی. بۆ شتی پیا نانێریتەوە.

گوڵزار: نا نا تکایە بارگیری چی؟

زاهید: جا بارگیر بوویتایە ئەم هەموو منەتەی بۆچی بوو؟

ئەردەڵان: تۆ جوان قسە بکە.

گوڵزار: بیانوو مەهێنەرەوە ئەردە گیان.. با تۆزێکیتریش یاری بکەین و ئیتر بڵاوەی لێ بکەین.

ئەردەڵان: ئەی چی لە سەیارەکە ئەکەن؟

زاهید: کرێنێکی بۆ ئەنێرم.

(( پاش کەمێک یاری کردن و شەڕە ئاو.. ))

گوڵزار: دەی بەقوربان با زیاتر ماندوو نەبی، بکەوە ڕێ.

ئەردەڵان: ئێ باشە.. من شەو ئەچمەوە بۆ دوکان ئەگەر هیچ ڕووینەدا.

زاهید: منیش دێم لە دوکان وەری ئەگرمەوە.

ئەردەڵان(( بۆ گوڵزار)): توخوا تۆش لەگەڵیا بێی باشە.. بە بینینت ماندوێتیم ئەحەسێتەوە.

گوڵزار: باشە گیان بڕۆ خوات لەگەڵ.

ئەردەڵان: ئەی ئێوا!!!!!؟؟؟؟؟ ئەترسم سەیارەکە چاککەنەوە.

گوڵزار: ئینجا چاکی بکەینەوە بۆ پێکەوە نارۆین.. دەی کۆڵەکە بکە پشتت باوانم دەی.. ئەها.. ئاوا ((کۆڵەکەی پێ هەڵئەگرن)) دەی بای ئازیز.

ئەردەڵان: بای.

(( دوور کەوتنەوەی ئەردەڵان ))

گوڵزار: نەجاتمان بوو.

زاهید: جا ئەگەر بیگەیەنێت هههە.

(( ئەمانیش سواری سەیارەکە ئەبن و ئەڕۆن))

# (( ئەڵقەی پەنجاو حەوت))

Cut

دیمەنی – ١١٨٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا دانیشتووەو لەتیف لەبەردەمیا وەستاوە))

ئاوا: ئا ئا، هەمووی خۆت بیکە تاقەتی فرت و فێڵی خەڵکی غەیرەم نییە کاک لەتیف.

لەتیف: بەسەرچاو.. زیاتر لەوەی لە توانامایە هەوڵ ئەدەم، ئەگەر زووش زانیم بۆم ناکرێ ئاگادارت ئەکەمەوە.

ئاوا: ئەوە باشە سوپاس.

نینا(( دێتە ژوورەوە)): ڕۆبۆتەکە هەرچییەکی کردووە فڕی بەسەر ژمێرییارییەوە نییە ئاوا گیان.. هەر لە خۆیەوە ژمارەی ڕیز کردووە هههە.. ئەبێ یەک دوویەک لە خاوەنبارەکارەکان و شۆفێری بارهەڵگرەکان بانگ بکەمەوە، پرسیاریان لێ بکەم.

ئاوا: سوپاس بۆ کاک لەتیف، بەداخەوە زۆر درەنگ بە ئاگا هاتینەوە.. ئەوانەی ئەوم هەموو بۆ ئامادەکە، بە تۆمارە وێنەییەکانیشەوە، با بیدەینە پۆلیس.. تاقەتی سەرێشەمان نییە.

لەتیف: منیش درەنگ زانیم.. بەڵام کاک ئاوا هیچ سودی نییە، هیچ شتێک دیار نییە تا بکرێ بە بەڵگە.. خۆشت ئەزانی درۆ بێکەسە.. بە ئاسانیی بە درۆ دائەپۆشرێ.

ئاوا: دەی باشە بەجیا هەڵیگرن با نەفەوتێ.

Cut

دیمەنی – ١١٨١ – ڕ/ د – شاخ و نشێو:

Mute

((ئەردەڵان بە ماندوویێتی بە شاخ و کێوانەوە.. کۆڵەکەی پێیە، بە جلو بەرگی دیمەنی – ١١٧٩ – ەوە.))

Cut

دیمەنی – ١١٨٢ – ڕ/ د – قاوەخانە:

(( شەنیاچاوەڕێی ساماڵ ئەکات و دڵنیاو ئارەزووی خوشکی دێن، هاتنە لای شەنیاو سڵاوی تایبەت بە خۆیان))

دڵنیا: پەڵپی لێگرتووم ئەبێ ئێکسسواراتی بۆ بکڕم.

شەنیا: ئای ئیتر وا دڵی تەڕ ئەبێ.!

ئارەزوو: نەوەڵا دڵم تەڕ نابێ، هەر جوانەو هیچیتر.

شەنیا: ئاقڵانی ئێمەش لەو تەمەنەی تۆیا هەروامان ئەوت ههە.

دڵنیا: عەیارێکە مەپرسە.

شەنیا: دیارە دیارە.

ئارەزوو: یەرمەتی هەیە ئێمە بچینە مێزێکیترو قسەی خۆمان هەیە؟

شەنیا(( پێکەنین)): ئەی بۆ نا عەیار باشی؟

دڵنیا: ئارەزوو من حەز ئەکەم لێرە دانیشین، کاتی قسە زۆرە.

ئارەزوو(( ئەڕوا)): تۆ لێرە دانیشە، من ئەچمە سەر ئەو مێزەی تر، ئاساییە بەخوا، قسەی خۆتان بکەن.

شەنیا: بڕۆ دڵنیا گیان بڕۆ، با لووتت لێ نەکا.

دڵنیا: باشە بە یارمەتی تۆ شەنیا گیان، ئەتبینمەوە.

(( دڵنیاو ئارەزوو ئەچنە مێزێکیتر))

ئارەزوو: ئەوە هاوڕێی نزیکتە؟

دڵنیا: ئا کچێکی زۆر باشە، ئەوە بۆ واتکرد داوەشێی هەر ئابڕوت بردم.

ئارەزوو: بەخوا بەڕاست پێت بڵێم چاویم بەدڵ نەبوو.. من لە مەکتەب لەو کەسانە دوور ئەکەومەوە چاویان وابێ.

دڵنیا: چاوی چییەتی؟

ئارەزوو: دە بە دڵم نەبوو و بڕایەوە، ئەگەر زۆریش حەز ئەکەی هەستە بچۆرە لای ئەو.

Cut

دیمەنی – ١١٨٣ – ئێوارە/ د – دەشتایی نزیکی شار:

(( ئەردەڵان بەڕوپۆی لەبەربڕاوە، پاڵی داوەتەوە بە کۆڵەکەی پشتییەوە ))

ئەردەڵان: وەی باوکە ڕۆ!!............ ئای مردم!!............ وەی خوایە گیان پسام!!.......... (( دەست بەناو سکییەوە ئەگرێ)) ئای سکم تەقی!! ............. ئەوەنەم نەماوە، تۆ بڵێی بگەمەوە شار؟ ................. بەخوا باوەڕ ناکەم، ڕەنگە بمرم و جارێکیتر گوڵە نەبینمەوە................ (( دائەنیشێ)) نا، ئەبێ تینێ بدەمە بەر خۆم، ئاوا بێغیرەتیی بە کەڵک نایەت............... ڕەنگە پارەی باشم بدەنێ........... ئەی وایە، ئەی چۆن؟ ........ (( دووبارە پاڵ ئەداتەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٨٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر بە تەنها لەسەر قەنەفە دانیشتووە.. هاوڕێ دێت بۆ لای))

هاوڕێ: ئێستا هەواڵێکم بیست.

خدر: خێر؟

هاوڕێ: ئەڵێن لەم شەوانەیا.. ئەردەڵان کۆڵێکی پێبووەو خۆی کردووە بە دوکانەکەیانا ، لە وەزعێکی زۆر خراپا بووە.

خدر: چۆن؟

هاوڕێ: ماندوو بووەو هەناسەسواریی زۆرو بە پشتا کەوتووە، ڕەوەزی لێ بووە، ئاوی داوەتێ و دەستی گرتووە.

خدر: ڕێک چ ڕۆژێک؟ مەبەستمە.

(( تریفە دێتە ژوورەوەو سڵاوو وەڵام))

هاوڕێ: باشە کاک حەمەخدر گیان چاکەشت بۆ ئەهێنم و ئەوەش ئەپرسم.

(( هاوڕێ ئەچێتە دەررەوە))

خدر: چاکی بەساقە؟

تریفە(( سەردائەخا)): زۆر سوپاس.

خدر: ئەوە چییە تریفە؟ بە نیازی تاکەی شەرمم لێ بکەی؟ تەواو.. عەیبە خۆ مناڵ نیین!.. هەر یەک تۆز کات هەبێ ئاسوودە بین و بێ کێشە.. هەموو شتێ ئەبڕینەوە.

تریفە: ئەترسم دایکم تورە بێ.

خدر: دایکت ئەبەد تورە نابێ، دڵنیا بە زۆریشی پێخۆش ئەبێ، چونکە هەر بەڕاست ئیتر ئەبم بە کوڕی.

تریفە: نااا.. مەبەستم ئەوەیە بڵێ منیان خستۆتە ئەو کۆمپانیایەو خۆشیان خەریکی دڵگۆڕینەوەن.

خدر: ئەوە شتێترە پەیوەندیی بە تۆوە هەر نییە.. دایکت قەت وا ناڵێ.. لەسەر من.. باوەڕکە ئەوەندەی لێ ڕائەبینم ئێستا بە تەلەفون پێی بڵێم و پیرۆزباییشمان لێ بکا.

تریفە: ئەی ئەبێ ڕای ئەوانیتر چی بێت؟

خدر: هیچیان تۆیان بۆ ئەوە داناوە شیربابییت لەسەر وەرگرن؟

تریفە: وەیرۆ شیربایی چییە؟

خدر: کەواتە هەموویان تەماشای ڕای تۆ ئەکەن.. بەڕاستی نەمئەزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان کچێکی ئەم ماڵە دڵم ئەباو وێرانم ئەکا بە عەشقی خۆی.. بەردەوام هەڵشۆم بە ناکەس بەچە ئەزانی،کە ناتوانێ ڕێزی تێکەڵاویتان بگرێ و ناپاکیتان لەگەڵ ئەکا.

تریفە: توخوا ناوی مەهێنە.

خدر: باشە قبوڵمە.. ناوی نابەین.

Cut

دیمەنی – ۱۱۸۵ – ش/ن – قاوەخانە:

(( شەنیاو ساماڵ ))

شەنیا: ئێستا تۆ ئامادەی.. داوای بینینیشی کردی.. وەک ئەوەی ڕێککەوتین، وا باسمکردوویت سەرت لە ئاسمانە.. ئیتر دەرفەتی هەڵە نەما.

سامالّ: ئۆکەی فشەیە.

شەنیا: ئای خوایە! هەتیو فشەیە لێرەیا ناوترێ.. هەر ئۆکەی بەسە.

سامالّ: ئۆکەی.

شەنیا: تۆ هیچ ناڵێی باسی ئەو ئیشانەی ئەوروپات ئەکەی کە وتمان.. لە قاپشتنەوە دەستت پێکردووەو دواتر لە ڕێگەی کەسێکەوە خوا خێرو بەرەکەتی بەسەرا ڕشتووی.. هەرچەند داوای ئیشەکەی کرد، هەر بزنس بوو، لەوە زیاتر ناڵێی.. ئێستا داوای هیچت لێ ناکا، بەرەبەرە نزیکتر ئەبنەوە.. هیچ پەلەت نەبێ.

سامالّ: خۆشم تاکتیکم هەیە، خۆ گێل نیم گوڵشەنیا؟

شەنیا: زۆر زۆریش باشی مەبەستم ئەوە نییە، مەبەستم ئەوەیە تا وریا بیت باشترە.. ئەگەر داوای کردیتەوە، وا ئەکەم سبەی شەو دەعوەتێکمان بکا، ئەگەر بۆ ماڵی خۆی بێ، ئەوا کارمان مەیسەرە، بەڵام بۆ دەرەوە بێ، خۆی کەم ئەمێنێتەوە.

سامالّ: تۆ هەست ئەکەی ئەم کوشتبێتی؟

شەنیا: نا، بەڵام ئەم گورگانە هەموو شتێ ئەزانن، هەر لێیان ئەکەوێ.. یان خۆمان ئیشیان لەسەر ئەکەین تا شتێ دەرئەخەن.. گرنگ ئەوەیە وا بکەی متمانەی دنیات پێ بکاو خۆشی بوێی.. ئیتر هەموو شتێ خۆی ئەڕواو باش ئەبێ.

سامالّ: ئەو تۆی زۆر خۆش ئەوێ.

شەنیا: بە ڕووکەش بەڵێ، ئەگینا بە خوێنی سەرم تینوە.. باوەڕ بە زمانلووسییەکەیان مەکە، من پێنج ڕۆژە ئەمەت پێ ئەڵێم.

ساماڵ: تێگەیشتم.

شەنیا: ئوتێلەکە چۆنە، هەر لەوێ ئەبی جارێ؟

ساماڵ: زۆر پاک و تەمیزو خۆشە.. ئەگەر پارەت لێ نابڕێ، با جارێ لەوێ بم.. زۆر ناخۆشە خۆت خزمەتی خۆت بکەی هههە تەممەڵی گرتوومی.

شەنیا(( زەرفێک دەرئەهێنێ ئەیداتێ)): ئەمەش بگرە نەک لێت ببڕێ.. خەمی هیچت نەبێ.. گرنگ ئەوەیە بتوانم شتێک بۆ خۆشەویستیی ڕاماڵ گیان بکەم، کە باوەڕ ناکەم بە هەموو ژیانم کەسیتر ئەوەندەی خۆش بوێم.

ساماڵ ((سەردائەخاو غەمگین)): کەچی دەسگیرانەکەی خۆی، هیچ هەڵوێستێکی نییە، وای ئەزانی بۆ پارەکانی داوای بینینیم کردووە.

شەنیا: پەیوەندیمان بە خەڵکەوە نییە چاوەکەم، گرنگ ئەوەیە ئێمە بە ئامانجی خۆمان بگەین و هیچیتر.. من ئەزانم بکوژەکەی خۆی دێتە بەردەستمان، دڵم وائەڵێ.

Cut

دیمەنی – ۱۱۸٦ – ش/ن –ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی تەنها دانیشتووە))

**ڕەمزی مۆنۆلۆژی ناوەوە**:

ڕەمزی گرژ:

کاکە دارەوان خۆت نەماوی منت هەم گەورەم.. هەردوو ئەوانەی چاویان بڕیوەتە ژنەکانت و سەروەت و ساماناکەت.. دڵنیابە، زۆریان پێ ناچێ ئەیاننێرمە لای خۆت، تا سەرو تفیان تێ بکەی.. من بەدڵ دڵسۆزتم و هەرچیت جێهێشتووە ئەیپارێزم.. لە ئاواش مەترسە، بە هێمنی ڕەوەزی لێ دوور ئەخەمەوە.. وا خەڵک ڕوومان تێ ئەکاو زۆر باش ئەچینە پێشەوە.. هەرکەس بەلای ماڵ و مناڵتا بێ، گەر نزیکترینی خۆشم بێ، لەناوی ئەبەم گەورەم.. تاکتیکم زۆرە بۆ دڵخۆش کردنت.. بێخەمبە بێخەم.

(( **مۆنۆلۆژ تەواو**))

(( دیدەوان خۆی شتووەو دێتەوە لای))

دیدەوان: ئەوە لە حەمامەکەیا لە بیری شتێکا بووم.

Cut

دیمەنی – ١١٨٧ – ڕ/ن - کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن دانیشتووە، دیدەوان بە باوەشێک گوڵەوە دێت))

دیدەوان: بەیانی شەشەمینت باش.

نارەوەن: بەیانیت باش دیدەوان، ئەرێ من ئەو هەموو گوڵە چی لێبکەم؟ هەر خەسار ئەبێ و شوێنیشم لێ ئەگرێ.. عەسرانیش هەردی و هاوکار ئەیبەنەوە.

دیدەوان: من ئەرکی خۆم بەجێ ئەهێنم، گرنگ ئەوەیە بە بەرچاومەوە نایخەیتە تەنەک خۆڵەکەوە.

نارەوەن: حەددی ئەوەم نییە ببورە، ڕێزی ئەگرم.. لەگەڵ کچە گەورەکەیا سوکە باسێکم کرد.

دیدەوان: ئەک ئافەرین، ئێ ڕای چۆن بوو؟

نارەوەن: وەڵا سەرەتا وتی دایکە تۆ تازە شووت بۆچییە عەیبە بەم تەمەنەوە.. ئیتر تۆزی پرتەو بۆڵەم کردو وتی وایە ئێمە بڕۆین تەنیا ئەکەوی.. بزانە ڕای ئەوانیتریش چۆنە؟

دیدەوان: ناوی منت هێنا؟

نارەوەن: نا نا .. وتم ئەگەر شتێکی وا ڕووبدا.. ئەوە بەم شەش ڕۆژە دەسکەوتێکمان هەیە، ئەمە یەکێکیان.. تۆش پەلەم لێ مەکە تکایە.. هەرچییەک بوو، ئاوا پێت ئەڵێم.

دیدەوان: باشە دڵەکەم ڕوحەکەم.. من ئیتر هیچ ناڵێم.

نارەوەن: تۆ وەرە سەیری ئەم لیستە بکە بۆمان هاتووە.. دەسکەوتی زۆر باشمان ئەبێت ئەم یەک دوو ڕۆژە.

دیدەوان(( ئەچێتە تەنیشتیەوەو سەیرێکی ئەکات و دێتەوە دواوە)): پێم بڵێ.. تۆ ئەتوانی وابکەی خدر ئیشە قورسەکانمان بۆ بکا؟ بەڵام ئامان نەزانێ من پێموتووی.

نارەوەن: بەخوا تۆ چەند ڕۆژێکە گرو دەورم ئەدەی بۆ خدر.. وا بزانم ناهێڵی خۆمان پارووەکی چەورمان دەسکەوێ.. هەست ئەکەم شتێکی گەورە هەیەو بەشە شێرەکەی بۆ خدر ئەبێت و بەرماوەکەشی بۆ من و تۆ.. بە قسەم ئەکەی مەیدە بە خدر.

دیدەوان: بۆ؟

نارەوەن: زۆر تەماعکارو پارەپیسە، هیچمان بۆ ناهێڵێتەوە.. با خۆم بیکەم دیدەگیان.

دیدەوان: وەی خوایە کە ئەمجارە دیدەگیانەکە چەند خۆش بوو.. ئازیزم، باوەڕ بکە ئەوە بە تۆ ناکرێ.

نارەوەن: دیارە متمانەت پێم نییە.. من هەموو ئیشێک ئەزانم و ئەتوانم هەوڵی بۆ بدەم.

دیدەوان: چاوەکەم ئیشەکە بە جۆرێکە، ئەو بەرماوەیەی تۆ باسی ئەکەی، بەشی یەک گەڕەک ئەکا بۆ کوڕاو کوڕیان، بە بێ ئەوەی قاچیشمان بکەوێتە قوڕەکەوە.. لێگەڕێ با ئەو بیکاو ئێمە بەس پارە کۆکەینەوە، پارەی چی؟ کچێ بە فەردەو بە گەڵابە.

نارەوەن: ئەترسم ئیشەکەی دارەوان بێ، کە سەری خۆی دانا لەسەری؟!

دیدەوان: بیستوومە دارەوان نەزانانە کردویێتی، بۆیە وای بەسەرهات.

نارەوەن: نەبەخوا ئەو ئیشە مەترسیی زۆرە حەزم لێی نییەو ئەوەش نییە تۆ باسی ئەکەی.

دیدەوان: زۆر لەوەش زیاترە نارەوەن گیان.

نارەوەن: نا تا ئەو ڕاددەیە نا ئەو کوڕە تیا بچێ و ڕەنگە بشزانن ئێمە هانمانداوە.

دیدەوان: ڕوحەکەم، با خدر نەزانێ منم، دڵنیابە ناوی تۆش نادا ئەگەر لە سێدارەش بدرێ.. باشترین بیرۆکەو سەلامەتترین و ئیتر هەر ناشزانی ملیارە دۆلار بخەیتە کوێوە.

نارەوەن: ملیار؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

دیدەوان: زیاتریش.

نارەوەن: تێمگەیەنە چۆنە؟ تا بەرەبەرە قسەی لەگەڵ دامەزرێنم.. لە کێی وەرئەگرێ و ئەیدا بە کێ و ئاخر ئەمە قسەیە چۆن بیگوێزێتەوەو؟

دیدەوان: ڕاستییەکەی جارێ منیش سۆراخی تەواویم نەکردووە، هەر ئەوەندەی سەرەداوێکم دەستکەوتووەو ئەزانم هەیە.. منیش بە ژیانم ئەو ئیشەم نەکردووە.. بەڵام وەکو هێلکەی پاککراو ئەیخەمە بەردەستت و خدریش بە زیرەکیی خۆی بیکا، دڵنیام تێناکەوێ.

نارەوەن: وەک بزانی زۆرەکەی بۆ ئەو نابێ، دوایی خۆیم بەسەرا بایاو ئیشیترم بۆ نەکا؟

دیدەوان: هەر خوا ئەکا دوو سێجار بۆمان ئەکا.. ئیتر ئیشی خدرمان ناوێ.. با بڕوا بۆ جەهەنەم.. ئیتر ئەوسا وەک ئێستا چاویشت لەدوای پارە نامێنێ.

نارەوەن: ئەی تۆ شەریکت نابێ؟ ئەویش مۆڵێ بەرێ؟

دیدەوان: نا دڵەکەم چۆن خەڵک تێ ئەگەیەنم و شەریک پەیا ئەکەم؟ ئەو ئیشە ئەبێ زۆر بە نهێنیی بکرێ.. بۆ خدریش من بە تۆ ئەڵێم بچێ بۆ کوێ و بیهێنێتەوە بۆ کوێ و تۆش بەو ئەڵێیت و بەس.

نارەوەن: دەی تۆ باش هەواڵی ئیشەکە بپرسەو من جارێ بە حەمەخدر ناڵێم.. توخوا با تۆزێ باش بیری لێ بکەمەوە.. ئێستا لەپڕ بوو زۆر ئەترسم، وی!

دیدەوان: تۆش بیری خۆتی لێ سافکەو منیش سۆراخی زیاتر ئەکەم. باشە.

Cut

دیمەنی – ١١٨٨ - ڕ/ن – دوکانی شیرینیی:

(( ڕەوەزو ئەردەڵان))

ئەردەڵان(( حەپەساو)): چۆن وەرگەڕا؟ شتی وا چۆن ئەبێ؟

ڕەوەز: نەک هەر وەرگەڕان، گوڵزاریش و زاهیدیش هەردووکیان مردن.

ئەردەڵان (( تێک ئەچێ)): ئەی هاوار گوڵە گیان مردووە؟

ڕەوەز: کەمێک بە ئاگابە لە دەوروبەرت ئەردە گیان.. ئەو کچە یاری بە ئەقڵت ئەکرد.. تۆ ئەزانی ئەو تلیاکەی تۆ هێناتەوە ئەوان لەگەڵ خۆیان نەیانبرد؟.. لەوێ وەرگیراو بە تۆیا ناردیانەوە، چونکە بەس تۆ ئەوەندە دەبەنگ بووی لەبەر ئەو هەشت سەعات بە پێ بیکوتی.

ئەردەڵان: ئەوە بەڕاستتە؟ یەعنی کردمی بە تلیاکچی؟

ڕەوەز: سوک.. سووک!!! با کەسێ گوێی لێ نەبێ.. نەک هەر تلیاکچی، کردتی بە بازرگانی تلیاکیش.. ئێستا حوکمەت بەوە بزانێ لە سێدارە ئەدرێی بابزانی.. هیچیشی نەدایتێ، کە ئەبووایە لەو پارە گەورەیەیا شەریک بوویتایە.. ئینجا وێنەشی گرتوویت و ناردوویێتی بۆ سەرۆکەکەی.

ئەردەڵان: وێنەی چی؟

ڕەوەز: بەڵێ.. لە مۆبایلەکەیا ئەوەم بینی، باش بوو من زوو گەیشتمە سەریان، پێش ئەوەی پۆلیس بیبینێ هەڵمگرتەوە.. هەر ئەوەش نا..

ئەردەڵان(( تۆقیو)): چیتریش؟

ڕەوەز: هەرکاتێ سەرۆکەکەی داوای ئیشی لەوجۆرەت لێ بکا، ئەبێ بڵێی بەسەرچاو ئامادەم، ئەگینا بە ڕێگەی خۆی ئەینێرێ بۆ پۆلیس.

ئەردەڵان (( تێکئەچێ)): ئەوە توخوا بەڕاستتە کاکە ڕەوەز؟ یەعنی ئیتر ناشتوانم دەستی لێهەڵگرم؟ توخوا فریامکەوە کاکە ڕەوەز دەستەکانت ماچ ئەکەم.

ڕەوەز: بۆ خەڵکیش منم بە سەرڕاستیی ئیشت لەگەڵا بکاو ؟

ئەردەڵان: توخوا شتێکم بۆ بکە، ڕزگارمکەی، بەڵێنت ئەدەمێ بچمەوە سەر حەماڵییەکەو تا ماوم نەچم بە لای ئەو ئیشانەیا.

ڕەوەز: باوەڕکە ئەوەیان لە چارەسەرا نەماوە.. ئەوی خۆشمان هەر وایکردووە.. ئێستا ئیشیترمان هەیەو ئەمجارە ئەبێ خۆت جێبەجێی بکەی.. چونکە ئەو کابرا سەگبابە لە کاتی کوشتنی ڕامالەکەیا ڕەسمی گرتووی، کە بە دەمانچەوە وەستاوی.

ئەردەڵان(( پێش بوورانەوەی)): توخوا کاکە ڕەوەز ئەوەم لەگەڵ مەکەن تۆبە.

(( ئەبورێتەوە))

Cut

دیمەنی – ١١٨٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی))

ڕەمزی: ڕێک تەواوە، ئەو ژنە لێرەبێ هیچمان بۆ ناکرێ.. ئەبێ بیرێکی لێ بکەینەوە چۆن بینێرینەوە بۆ ماڵەوە.. ئەم مۆڵەتی هاوسەرگیرییەی بۆ خۆمان زۆر باش بوو.

شەنیا: خۆ نایکوژی؟

ڕەمزی: نا داماوە، وەک ژنەکەیتری دارەوان نییە، ئەم ڕێ لە هیچ ناگرێ.

شەنیا: بۆ ئەو ڕێمان لێ ئەگرێ؟

ڕەمزی: بەوبێ هیچمان دەست نەکەوێ، هەمووی بچێتە ماڵی ئەو.

شەنیا: دە ئێوەش وەک کاک دارەوان بکەن لێی بشارنەوە.. دوای ئەوە ئەبێ ئەو چی بوێ؟ بە پارەیەکی کەم دوور ئەخرێتەوە.

ڕەمزی: نەبابە، چاوی بە هیچ تێر نابێ.

شەنیا: جا خۆ ئێستا هیچ نییە تا ڕێ بگرێ.. ئەگەر حەز ئەکەی، کە هاتە گروپەکەوە خۆمی لێ ئاشکرا ئەکەم و تێی ئەگەیەنم کە ئیش وا ناکرێ.

ڕەمزی: چارەسەرێکی باشە.. بەڵام دیارە ئێستاش دڵت بۆ دایکی ئامۆ ئەیەشێ.. ئەرێ تۆ پێم بڵێ، ئەم سامالەت خۆش ئەوێ یان ئامۆ؟ من تێناگەم.

شەنیا: ماڵی دارەوان، نە دڵم بۆیان ئەیەشێ و نە بە خەیاڵیشمدا دێن هەرچییەکیان بەسەر بێت.. ئێستا خەریکە هەستێکم بۆ سامالّ لا دروست ئەبێ.. (( بەنازەوە)) جارێ هیچ نییە توخوا ئەو باسە داخە.

ڕەمزی: دەی دەی پیرۆزە.. ئەوە بەو بۆنەیەوە ئەم ئێوارەیە پێکەوە نانێک ئەخۆین.. بە کەڵکی ئیشەکەمان دێت؟

شەنیا: نازانم.. ئەوەیان خۆت هەڵیسەنگێنە.. باشتریش وایە دوور بێ، کوڕێکی زۆر ناسکە.

ڕەمزی: ئاگام لێیە ئەویش خۆی لەتەل ئەداو قیت و قۆز دێت بە شوێنتا.

شەنیا: یاخوا ئەمجارەیان بە دڵی خۆم بێ.

Cut

دیمەنی – ١١٩٠ – ڕ/ن - دوکانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان زۆر غەمبار دانیشتووەو خدر دێتە ژوورەوە))

خدر: وتیان نەساغی ئەردەڵان، وتم با سەرێکی بدەم، پێویستییەکە شتێکە، وتم قەیچێکا وەک ئەو نەهات بۆ لای باوکم.. با من وەک ئەو نەبم.

ئەردەڵان(( لە جێی خۆی هەڵناسێ و بە زەحمەت قسە ئەکا)): خەجاڵەتم کاک حەمە خدر.. ئالاوم بە دەردی خۆمەوە هەر مەپرسە! بەخوا ئاگام لە دنیا بڕاوە.

خدر: نا نا هیچ نییە، ڕەنگە هەر ماندووی ئەو شەوە بیت کە خراپ گەیشتبوویتەوە دوکان و کەوتبووی بە پشتا؟

ئەردەڵان: کێ پێی وتی؟ ئەوەشت زانی؟

خدر: هەر خێرەومەند زۆرە.. کاکە ئێمە برای یەکین ئەبێ بەدەم یەکترەوە بین.

ئەردەڵان: کاکە حەمە خدر گیان فریامکەوە، خراپ قاچم لەو قوڕە گیر بووە کە بەدەستی خۆم گرتوومەتەوە.

(( ڕەوەز بە ڕاکردن ئەگاتە ژوورەوە))

ڕەوەز: ها کاکە ئەردەڵان چ خێرە دیسان؟ لەوبەرەوە بینیمیت تەواو نیت بە ڕاکردن گەیشتم، هەر خەریک بوو سەیارەیەکیش لێمبا.

خدر: ناشوکر باشە.

ڕەوەز: بە یارمەتی خۆت برا، ئەیبەم بۆ خەستەخانە.

ئەردەڵان: نا نا باشم کاکە ڕەوەز.

ڕەوەز: جا گەر بە قسەی تۆ بکەم تا ئێوارە نەماوی.

خدر: با بێم لەگەڵتا هاوکارییت ئەکەم.

ڕەوەز: نا قوربانی تۆ، هەر خۆم دەرەقەتی دێم، بە قەڵەویەکەی تێمەکەوە.

ئەردەڵان: بەخوا هیچم نییە کاکە ڕەوەز لێمگەڕێ، هەر خۆم حەزمکرد پاڵبەمەوە (( هەڵئەسێ)) ئەها ئەهـ هیچم نییە.

ڕەوەز: بە قسەت ناکەم، وەک دوێنێت لێ بێتەوە. هەستە بە تەکسی ئەڕۆین.

خدر: سەیارەم پێیە با بیهێنم.

ڕەوەز: سوپاس پێویست ناکا.

(( هەرسێکیان ئەچنە دەرەوە))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١١٩١ – متبوع- ڕ/ د – سەرشەقامی بەردەم ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر لە دوکانی ئەردەڵانەوە ئەچێتەوە بۆ ئۆفیسی وەکالەت.. دڵنیا بەرەو ڕووی دێت، دڵنیا قاچی خوار ئەکاتەوە وەک ئەوەی بکەوێت و ئاخ ئەکات))

خدر (( ڕائەکا دەستی ئەگرێ و ڕاستی ئەکاتەوە)): سەلامەتیت خانم.

دڵنیا: زۆر سوپاس، ئەرکت کێشا، وەڵا خەریک بوو ملم بشکێ.

خدر: نا خوا نەکا هیچی وا نەبوو.. ئاگات لە خۆت بێ دادەگیان.

دڵنیا: زۆر سوپاس.. تۆ بڵێی قاچم دەرنەچووبێ؟

خدر: ئادەی تۆزێک بڕۆ.

دڵنیا (( خۆی ئەلەنگێنێ)): ئۆو ئازاری زۆرە.

خدر: خۆت نیشانی دکتۆرێ بدەی باشترە، ڕەنگە گەرماوگەرم بێ جارێ دیار نەبێ.

دڵنیا: ئای خوایە! جا ئێستا چۆن بگەمە شوێنێک.

خدر: ئەگەر بە تاکسییەک بڕۆی زووتر ئەگەی باشترە.

دڵنیا: ڕاستە بەڵام ناتوانم هەنگاو هەڵبێنم، ئەبێ یەکێ دەستم بگرێ.. توخوا ببورە چاک بووم بە ئەرک بۆ جەنابت.

خدر: نا ئەرکی چی دادەگیان؟ هیچم نەکردووە.. حەز ئەکەی وەرە ئۆفیسەکەی ئێمە، کچێکی لێیە با بتبا بۆ نەخۆشخانەیەک.

دڵنیا: ئەی چۆن بگەمە ئۆفیسی ئێوە، بەڕاستی ناتوانم هەنگاو هەڵێنم.

خدر: ئاساییە ئەگەر ڕازیی بیت برای خۆت دەستت ئەگرێ.

دڵنیا: بە خۆشحاڵییەوە، سوپاسیشت ئەکەم.

(( خدر قۆڵی دڵنیا ئەگرێت و بەرەو ئۆفیس ئەچن، دڵنیا وا خۆی دەرئەخا ئازاری زۆر بێت، خۆی جووت ئەکا لەگەڵ خدرا ))

دڵنیا: تۆ پیاوێکی میهرەبانیت، لە ژیانما هەستم بە دڵنیاییەکی لەمجۆرە نەکردووە.

خدر: نا.. خوشک گیان هیچم نەکردووە.

دڵنیا: ژیانی من هەر کوێرەوەریی و بێکەسییە، باوکێک برایەکم نەبووە تا وەک ئەوەی تۆ ئێستا ئەیکەی، پشتم پێ بەستبێ و بە متمانەی ئەو بڕۆم بە ڕێیا.

خدر: هەموومان ژیانمان پڕیەتی لە ئازارو خۆخواردنەوە.. گوێی مەدەرێ، ژیان چۆن بێ ئاوا ڕامان ئەهێنێ.

دڵنیا: ئەوە لە کاتێکیشدایە کەسانی وەک تۆش هەن ئەو دڵنیاییە بدەن بە بێ داڵدەکان.

خدر(( پێکەنین)): خۆ ئێمەش پێمان ناکرێ هەر بۆ بێداڵدەکان بژین.. خۆشمان داڵدەمان ئەوێ. بڕۆ بڕۆ ئاگادار بە.

دڵنیا: وەک جەنابت ئەیڵێی بێداڵدە زۆرن، بەڵام لای یەک کۆنەبوونەتەوە.

خدر: ئەوە ئۆفیسەکەیە، فەرموو بچۆ ژوورەوە ئاگاداری خۆت بە، دەی ئاوا، وریابە.

(( ئەچنە ئۆفیسەکەوە ))

تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١١٩٢ – متبوع – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە هەڵئەسێت و دڵنیا لە خدر وەرئەگرێت و دایئەنیشێنێ، دڵنیا قاچی بەمدیو و ئەودیوا با ئەدات))

تریفە: ئەوە چییە؟ سەلامەتیت بەقوربان.

دڵنیا(( خەریکی بادانی قاچییەتی)): زۆر سوپاس (( پاش کەمێک)) گوێتان لێ بوو؟

تریفە: لەچی؟

دڵنیا: تەقی.. بەڵکو ئیشەڵڵا چاک بووبێ، ئادەی بزانم (( هەڵئەسێتە سەرپێ و یەک دوو هەنگاوی ئاسایی)) ئۆو تەواو چاک بوو (( بۆ خدر)) هیچ ئازاری نەما.. زۆر سوپاس کاکە گیان بەڕاستی منەتبارت کردم، تۆ نەبوویتایە جۆرێکیتر ئەبوو.

خدر: نا من هیچم نەکردووە.. گرنگ ئەوەیە تۆ باش بوویت، ئەوە هەموو شتێکە.

دڵنیا: زۆر ممنونم کاکە.. من ناوم تروسکەیە، ئەی ئێوە؟

تریفە: من تریفەم ئەویش ........

خدر(( قسە بە تریفە ئەبڕێ)): ناو پێویست ناکا بەساقە.. بە خۆشحاڵییەوە تۆ باشیت و لەمەولا ئاگاداری ڕۆشتنت بە.. ئەگەر ئەمرێ کارێکت نییە، ئێمە ئیشی ئۆفیسمان زۆر بەسەرا کەوتووە، لە ئامانەتی خوادا بیت.

دڵنیا: زۆر سوپاس ئەرکتان کێشا، هەر حەزمکرد ببم بە هاوڕێتان و جاروبار یەکتر بەسەربکەینەوە ئەگەر لە فەیسبوک و ئێنیستاش بێ.

خدر: دادەی بەڕێزیت.. ئێمە ئەو شتانە بەکارناهێنین ببورە، نەوەی کۆنین.. هاوڕێیەتیشمان بەهۆی زۆریی ئیشەکانمانەوە زۆر بەرتەسکە.. زۆر ببورە خوات لەگەڵ. (( ڕووئەکاتەوە تریفە)) ئا تۆ ئەو حسابەی دوێنێم بدەرێ.

دڵنیا(( کەمێک لێی ڕائەمێنێ و پەست ئەبێ)): باشە سوپاس، خواحافیز (( ئەچێتە دەرەوەو دەرگا توند دائەخا))

تریفە: خواحافیزت بێ.. (( بۆ خدر)) ئەرێ ئەو کچەت بۆوا ڕووشکێن کرد؟ ئەوەندە ڕەقیت؟

خدر: نا.. ئەو کچە خۆی وا نیشاندام قاچی لەجێ چووە، ئەیویست من بیبەم بۆ نەخۆشخانە، کە زانی تۆی لەگەڵ ئەنێرم چاری نەماو وتی چاک بوو.. درۆی ئەکرد هیچی نەبوو.. بۆ من نێررابوو، هەرچەند ئەبووایە یەکەمین دەقە بمزانیایە، بەڵام بەزەییم پیا هاتەوەو پێم گوناح بوو جێیهێڵم.. کێشە نییە گرنگ ئەوەیە خۆی بە ئاگای هێنامەوە، ئەگەر هاتەوە ڕووی نەدەیتێ.

تریفە: ئۆوو! ئەم بەزمانەش هەیە؟

خدر: ئا ئا زۆریشە.. وریابە زوو لەگەڵ هیچ کەسێکا نەبیتە دۆست و هاوڕێ، ئەگینا وەکو مارەکە پێتەوە ئەدەن.

تریفە: وانەیەکی باش بوو، هەرچۆنێکت پێ بوتمایە وەرمنەئەگرت، باش بوو بە چاوی خۆم نمایشەکەیانم بینی.. بەڵام کێ ئەڵێ ئەمیش لەو جۆرە کەسانە بوو.

خدر(( کەمێک وەستان و خەندە)): من!.

Cut

دیمەنی – ١١٩٣ – ڕ- ئێوارە / د – چێشتخانە:

(( لە کۆتایی نانخواردندا ڕەمزی کە لەگەڵ شەنیاو ساماڵ دانیشتووە، هەڵئەسێت و پاش کەمێک دێتەوە))

ڕەمزی: ئەوە خواردنەکەو چاکان دراوە.. ببوورن من ئەبێ زوو بڕۆم میوانم هەیە.. ئێوە دانیشن.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی ڕەمزی))

شەنیا: پێموتی هەروایە زوو ئەڕوا.

ساماڵ: کابرایەکی موخەنەت دیارە.. هەر لەژێر چاویەوە ئەڕوانێ، وەک ئەوەی بەردەوام لە بۆسەیا بێ.

شەنیا: واو چەند جوان دەستنیشانی کەسایەتییەکەیت کرد.. زۆر تەواوە ڕێک وایە، ئەوەش بزانە ئامانی نییە.

ساماڵ: ئەی خۆم چۆن بووم؟ هەڵەم نەبوو؟

شەنیا: نا باش بوویت، بەس پلیزت زۆر بەکارهێنا من تۆقیبووم، لەبری هەر سەرڕاوەشاندنێکیش ئەتوت ئۆکەی و جارێکیش بە منت وت غەزەب تۆ چیت؟ ئا یەکجاریش لەبری سترێس وتت سترێج. ههه

ساماڵ: دە ئەبێ ئەبێ، ئەو وردە هەڵانەش هەر ئەبێ.. بۆ بەڕاست سترێج نییە؟

شەنیا(( تریقەو پێکەنین)): نا هەتیو نەبی سترێس، یەعنی فشار.

ساماڵ: ئەها (( لەبەرخۆیەوە)) سترێس سترێس سترێس.. تەواو.. چاک بوو.

شەنیا: بە گشتیی چی حاڵیی بوویت؟

ساماڵ: باش تێنەگەیشتم، خۆی ئیشی گەورەی هەیە، یان هاوڕێیەکی.. هەرکامیان بن وا ئەزانم دڵی پێخۆش کردم ئیشێکی لەگەڵا بکەم ئەگەر بچووکیش بێت.

شەنیا: ئەو سەرەتا وا دەستی پێکرد.. زۆرم بە دڵ بوویت کە لەسەری نەڕۆشتیی و باسەکەت گۆڕی.. بەوە ناچارت کرد خۆی جارێکیتریش باسەکە بکاتەوە، ئەوە بوو من لە دەمم وەرگرتی و ئامادەیی تۆم بۆ کرد بە مەرج.. من باش تێیان ئەگەم ساماڵ گیان، ئەمانە پێویستییان بە شێوازی خۆیان هەیە بۆ ملشکاندنیان.

ساماڵ: ئەگەر بمبوری من نامەوێ ئەو هەموو ڕقەی تۆ لە خۆما بچێنم بۆ ئەم پیاوە.

شەنیا: پێمەوە دیار بوو؟

ساماڵ: ئەوکاتە نا.. بەڵام ئێستا وەک ئەوە وایت کە بزانی ئەو ڕاماڵی کوشتبێ، یان باوەکوشتەی خۆت بێ.

شەنیا: من ڕقم لە هەموو کەسێکە بچووکترین زیانیش بەخەڵک بگەیەنێت، کە زیانەکە لەسەر بنچینەی متمانەو سادەیی کەسەکە بێت.. ئەم ڕەمزییەش لەو کەسانەیە ساماڵ، زۆر پیسە.

Cut

دیمەنی – ١١٩٤ – ش/ن – ژوورێکی چۆڵ:

(( ژوورێک هیچی تیا نییە، ڕەوەز بە شەق و زللەو وایەر یان سۆندەو کێبڵ لە ئەردەڵان ئەدا کە دەستی بەستراوەتەوە لەدواوە، زۆر شوێنی ئەردەڵان جێی لێدانی پێوە دیارەو تەڕە، دەمی بە لەزگە بەستراوە))

ڕەوەز(( لەگەڵ شەق لێدانا)): سەگی سەگباب..... ئا ئا.. خۆ خەریکە دنیامان لێ تێبگەیەنیٚ چی ئەکەین و چی ناکەین؟ بیللاهی نەتتۆپێنم دەستت لێ هەڵناگرم.. (( ئەردەڵان ئەبورێتەوە)) ئەوە دیسان مردار بووەوە، ئەم کەرە زلە بەرگەی دوو شەق ناگرێ، ئەوە چوار جار بۆم ببورێتەوە، بە زلییەکەی بووایە وتم تا بەیانی بەرگە ئەگرێ. (( سەتڵێکی ماستی پڕ ئاوی پیا ئەکاو دێتەوە هۆشی خۆی.. لەزگەکەش لە دەمی ئەکاتەوە))

ڕەوەز: جا سەگباب وا جیهازم لە ژوورەکە دانەنایەو گوێم لێ نەگرتیتایە.. خۆ ئێستا سرِوطرِت دابووە دەست ئەو بزنمژۆکەیەوە.

ئەردەڵان: تۆبە کاکە ڕەوەز گیان تۆبە.. ئەخیر جارم بێ.. بەڵێن بێ یەک وشە لە هیچ شوێنێک و لای هیچ کەسێک نەدرکێنم.

ڕەوەز: بارگیرە زل، پێس هەموومان خۆت لە سێدارە ئەدرێی.. نەئەبووایە یەک زەڕڕە ئەقڵ بەکار بێنی و بتزانیایە تۆ یاری بە ئاگر ئەکەی؟ چۆن بەو ئەڵێی فریامکەوە.. دوای ئەوە چی ڕوویداوە فریات بکەوێ یان نا؟

ئەردەڵان: تۆبە، تۆبە.. ئەمجارە ئەگەر هەر شتێکم لای هەرکەسێ درکاند، هەقتە بمکوژی. بمکوژە کاکە ڕەوەز.

ڕەوەز: بەبیللاهی، دەمت بە هەر جۆرێک لەو مەسەلانەیا هەڵبێنی، ئەمجارە گۆشتاوگۆشت (( دەست بە ملیا ئەهێنێ)) ئەڵقاوئەڵق سەرت ئەبڕم.

ئەردەڵان: بەسەرچاو.. ئەمرەکەی، ئەمەم بەسە، حەیام بێ لای هیچ کەس نەڵێم کێشەم هەیە. تەواو بەخوا، ئیتر هەر پێئەکەنم.

ڕەوەز: سەرۆک وتی بیکوژەو لەناوی بەرە.. بەڵام من بەڵێنم پێدابووی کە پشتت بم لەم گروپەیا، وتم بیدەنە دەستی خۆمەوە وای ئاقڵ ئەکەم جارێکیتر دووبارەی نەکاتەوە.. ئەگینا بە هەرکامیانی بوویتایە، ئێستا ئینکیرو منکیر بەدیارتەوە بوون، نەک من.

ئەردەڵان: ئەزانم بەخوا ئەزانم.. بێنە دەستت ماچ بکەم.

Cut

دیمەنی – ١١٩٥ –ڕ/د – ناو سەیارەی دەوران:

(( دەوران شۆفێرەو هەستیی لە سەکن دانیشتووە))

دەوران: بەو پێوانەیەی کردت، دیزاینەکانم بۆ بکە، کۆنەکەی زۆر تێکچووەو هەر بەدڵیشم نەبوو.. ئیتر هەندێکیان بە لیدو ڕووناکیی و چواردەورەکەشی با فلێکس بێ و بلاجکتۆری گەورەی لەسەر بێ.

هەستیی: شتێکت بۆ ئەکەم دووەلیی.

دەوران: لۆکاڵییم بۆ بکەو با جوان بێ، دوەلیی و موەلیم ناوێ.. هەستی ئەزانی ئەوەی ئەڵێ شازو دوەلیی و ئەوشتانە فشەکەرن؟ هههە شتەکانیان زۆر ناشرین دەرئەچێ، زۆرتانم تاقیکردۆتەوە.

هەستی: ئەزانی ئەو کچانەی کە ناویان دەورانەو سەیارە لێئەخوڕن زۆر فشەکەرن هههههە.

دەوران(( پیائەکێشێ)): کورە تۆ هەر بەرەڵا بوویت من دڵم نایەت قسەت پێ بڵێم سەلکەسەگ.

هەستی: ئەمە لە کەیەوە سەگیش سەلکی پەیاکردووە؟ هههە

دەوران: لەوکاتەوەی تۆ لە دایک بووی هههههە.

هەستی: ئەوە با شتێکت بۆ بگێڕمەوە.. ڕۆژێکیان وەک تۆ کچێکی ئەربابی خۆتان هات بۆ ئۆفیسەکەم داوای دیزاینی کرد بۆ ساڵۆنەکەی.. منیش وتم باشە با بچین سەیری ..

دەوران: هۆپ تکایە بوەستە. تەواوی مەکە.

هەستی: بۆ؟

دەوران: ئەڵێم بەیانی بیگێڕیتەوە باشتر نییە؟ ئاخر نەک بەیانی بۆ قسە دامێنیت. هههههە.

Cut

دیمەنی – ١١٩٦ – ڕ/ د – ناوبازاڕ:

Mute

(( هەرمێ و تریفە دوکان و بازاڕ بۆ جلوبەرگ و خاولی و ڕۆب و ماکیاژو جلی ژێرەوەو نوستن و پێڵاو و جانتا ئەگەڕێن، بۆ هەرمێ، بە پارەی تریفە))

Cut

دیمەنی – ١١٩٧ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو ڕاهۆز))

ڕاهۆز: گەورەم جوڵە لە ناوچەی منا تەنها داتایەکی بێ پراکتیکەو ئەدرێتە نارەوەن.. جوڵەی دیدەوان دووبارە بوونەوەیەو هیچ لادانێک تۆمار نەکراوە.. هەرچەند بەو داتایانە بێ کە ئەیدا بە نارەوەن ئەبووایە ئێستە ناوچەکە زۆر فراوانتر بووایەتەوەو دیدەوان دەرچوونی نائاسایی هەبووایە.. ئەوە کۆی ڕاپۆرتەکانی دوو ڕۆژی پێشینە.

(( کۆژین دێتە ژوورەوە تحیە بۆ سەرکۆو ڕاهۆز بۆ کۆژین))

سەرکۆ: کەواتە هەڵخەڵەتێنەرەو تێستی تازەیە.. یان ڕووداوەکان بە ئاراستەیەکیتردا ئەبرێت و نارەوەن بە هاوسەرگیریی و چاوەڕوانییەوە ماندوو ئەکەن.

ڕاهۆز: گومانێکیشم لادروست بووە، شتێکی وای پێ بکەن، خۆی نەزانێت بۆ ئەو ئیشە تەرخان کراوە، وەک بێستان خان و ئەو ژنەکەیتر.

سەرکۆ: وردتر سەرنج بدەرە ڕاپۆرتی نارەوەن و هیچ وتویوکیش فەرامۆش نەکات.. ئەی لای تۆ ڕائید کۆژین؟

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم.

کۆژین: گەورەم دوکانی شیرینییەکە داخراوەو دوای بردنی ئەردەڵان بۆ نەخۆشخانە، هیچ شوێنپێیەکی دیار نییە.

سەرکۆ: وێنەی ئەردەڵانەکە بدەن بە هەموو سەرچاوەکانیتریش.. بەتایبەت ئەوانەی دەوروبەری نیشتەجێ بوونی، لای مولازم هەریارە.

کۆژین: ئەی ڕەوەز؟

سەرکۆ: ئەویش دیار نییە؟

کۆژین: لای من نەء گەورەم.

سەرکۆ: کەواتە بە دۆزینەوەی چاودێریی وردیش بکرێ، وێنەی ئەویش بڵاوکەنەوە.

کۆژین: گەورەم گۆڕانکارییەکەی حەمەخدر، خەریکە زیاتر شۆڕ ئەبێتتەوە.

سەرکۆ: چۆن؟

کۆژین: بە نیازە تریفەی کچی نارەوەن داوا بکا.

سەرکۆ: ئاساییە، تا ئێستا ئەو کوڕە گرنگیی بەخۆی نەداوەو نەیپەرژاوەتە سەر خۆی.. ئەویش وەک هەر یەکێ لە ئێمە، پڕە لە هەست.. دیارە ئێستا بە کاتێکی ئارام ئەزانێ بۆ ئاوڕدانەوە لە خۆی.. مادام جوڵەی خێراشمان نییە، بۆ نا؟.. پیرۆزە.

کۆژین(( خەندە)): کەواتە پیرۆزبایی جەنابیشتی پێ بگەیەنم؟

سەرکۆ: بەڵام یەکەم زۆر دەست و برد بکا نەک ڕووداوی نەخوازراو بێتە پێشەوەو دووەم ئەو کچە بە هیچ جۆرێک لە بازنەی خۆی و نارەوەن نزیک نەکاتەوە.

کۆژین: نا گەورەم، کچەکە بە هیچ جۆرێک بۆ ئیشکردن دەست نادا، ئەوەمان لەگەڵ حەمەخدر باسکرد.

سەرکۆ: دەی کەواتە پیرۆزەو بە خۆشیی.

Cut

دیمەنی – ١١٩٨ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر - ژووری ئامۆ:

(( دەوران و ئامۆ))

ئامۆ: ئەی نەیوت کەی دێینەوە؟

دەوران: دوو بەیانی.

ئامۆ: ئاسوودەی لەماڵی کاک زوبێر؟

دەوران: هەر زۆریش.. بەس ئەمڕۆ حەز ئەکەم بێمەوە بۆ ماڵی ئێوە، ئاساییە؟

ئامۆ: ئەوە چی ئەڵێی بەساقەوبم؟ ماڵی هەمووماننەو بۆ هەموومان ئاساییە تیا بژین و بۆ کەسیش نییە پرس بکا بڵێ بێمەوە یان نەیەمەوە.. من هەر یەکەم شەو پێموتی حەز ئەکەم بێیتەوە ماڵی باوکت، خۆت شەرمت کردو منیش ڕێزی شەرمەکەم گرتی.

دەوران: ئێ دەی باشە.. من دێمەوەو بابەتێکیش ئەوروژێنم.

ئامۆ: هەر بە نیازی شوو نەبی وازوو؟!

دەوران: کاکە تۆ زۆر زیرەکی، حەزم ئەکرد هەر هاوڕێ بووینایە، ئەم خوشک و برایەتییە چاک لە یەکی دوورخستینەوە.. ئەوە بۆ خوشک و براکان بەردەوام پێکەوە دانانیشن؟ هەهە ناکرێ؟

ئامۆ: منیش نازانم بۆ وایە؟ گەر ماڵی لێدەرکەی بە هەموو ژیانم ئەوەندەی لە هاوڕێیەتییەکەمانا لەگەڵ تۆ دانیشتووم، بە چارەکی ئەوە لەگەڵ تریفەو تیرۆژ دانەنیشتووم.

دەوران: من ئەوانەت لێ قبوڵ ناکەم با چاک بزانیت.. لەمەولا ئەبێ لەگەڵ من و ئەوانیشا بێیتە دەرەوەو پیاسەمان پێ بکەی.. حەی حەی لەم برا گەورەیەمان؟؟؟؟؟

ئامۆ: تۆ جارێ خۆتی لێ مەدزەرەوە.. ئەو کەسە بەهێزە کێیە توانیویەتی دڵی تۆ بدزێ؟

دەوران: وابزانم شتێکم لێ تێگەیشتووی، کە من باوەڕم بە دڵداریی و دڵدزین و شکان و ڕەنجاندن نییە.. هەتیوێکی دیزاینەر هەیە، وەک خۆم شێتەو جەوە جەو.. پێیوتم شووم پێ بکەو منیش وتم باش، با پرس بە کاکم و خوشک و براکانیترو باوکە تازەکەشم بکەم.. ئیتر ئەمشەو پرستان پێ ئەکەم و ئێوەش وەک من بڵێن باش.. هەر ئەوەندەو ئاو بێنەو دەست بشۆ.

ئامۆ: چەتیوە شێتە چۆن شوو وا ئەکرێ؟ جەوی چی جەو جەوت گرتۆتەوە؟ ئەی خۆشت ئەوێ؟ خۆشت ناوێ؟

دەوران: ئەی کە بەکەسێک مورتاح بووی، یەعنی خۆشت ئەوێ.. ئیتر من تاقەتی ئەوەم نییە هەموو شەوێ مەسج و مەسجکاریی و ئاگات لەخۆت بێ و بەساقەوبم و هەناسەو دڵ و ئا زستانانیش ئەو کەسانە ئەڵێن (( بە گاڵتەپێکردنەوە)) خۆت جوان داپۆشە هەناسەکەم.. ئەوە من نیم، هاوسەرگیریش ئەکەم و هەر وەکو ئێستاش ئەبم.

ئامۆ: ئاخر ئەگەر سۆزی نەدەیتێ و خۆشەویستی بۆ دەرنەبڕی، پاش یەک دووساڵ ئەڵێ من لەگەڵ هاوڕێ ئەژیم نەک ژن.

دەوران: ئای کە ئەوە خۆشترە هاوڕێم بێ، نەک مێرد.

ئامۆ: جا ئەزانی دوایی ڕای ئەگۆڕێت و چی ئەکا؟

دەوران: هەرچی ئەکا با بیکا.

ئامۆ: تەڵاقت ئەدا.

دەوران: وەی خەم؟! هیچ ناکەم خەمی بۆ بەکۆڵەوە ئەگرم.. منیش ڕێک شوویەکی قیت و قنجی تری لێ ئەکەمەوە.

ئامۆ: بۆ ئەویش گەر هەر بەوجۆرە بی وا ئەکا.

دەوران: چیم نەکراوە؟ یەکێکیتر.

ئامۆ: جا دەوران گیان ئەمە شووە یان حەکایەتی مێش.. لێرە نا.. دواى دەوام بە قسەت ئەکەم و دێمە دەرەوەو ئەچین بۆ پیاسە.. بۆت باس ئەکەم شوو کردن و ژنهێنان چییەو چۆن ئاسوودە ئەبیت.

دەوران: کاکە ئەترسم بەقەدەر دایکم کلاسیک بیت لەو مەسەلانەیا.

ئامۆ: نا دەوران گیان زۆر واقیعی ئەبم لەگەڵتا.. بەپێی ئەوەی کە ئێستا ژیانی مۆدێرنی خۆمان ئەیخوازێ.

دەوران(( هەڵئەسێ)): ڕێککەوتین.. سەیارە دەرمەکە، دێم بە شوێنتا.

Cut

دیمەنی - ١١٩٩ - ڕ/د - قاوەخانە:

(( دڵنیاو سەرچڵ ))

دڵنیا: نا بەساقەوبم کەمتوانایی من نییە، بەڵام ئەو کابرایە بەشەر نییە نی.

سەرچڵ: وا مەڵێ هیچ پیاوێک نییە لە ئاستی کچێکی جوانی وەک تۆیا غەریزەی ڕاینەگرێ.

دڵنیا: تەنها ئەو دەعبایە نەبێ.. کورە ئەوە کەی زەلامە سوودی لێوەربگیرێ؟.. باوەڕ ناکەی چەند وروژێنەر خۆم نیشانداوە، هەرچی ئەو عالەمی خوایە بوو سەیریان ئەکردم، ئەو نەبێ.

سەرچڵ: چۆن؟ شتی وا نابێ.

دڵنیا: خۆ درۆشت بۆ ناکەم، ساڵۆنم کردو چوومە نزیکی ئۆفیسەکەی بەڵکو بێتە دەرەوە.. هەر ئاوی پێم داهات تا هاتەوە بۆ ئۆفیس و ئینجا تیروتوانجی ئەو خەڵکەو چاوزەقکردنەوە.. خەریک بوو لە پێستی خۆم ئەهاتمە دەرەوە.. جەنابیشی هەر لەگەڵ هات، بردمییە ژوورەوە بۆ لای کچەکەیترو دواتریش هەر بە ئاشکرا دەری کردم وتی ئیشمان هەیە.

سەرچڵ یەعنی قسەت لەگەڵ نەکرد؟

دڵنیا: ئەی من چیت پێ ئەڵێم؟ پێش ئەوەی بچێتە سەیارەکەیەوە چووم یەخەیم گرت و زۆر بە ناسکیی قسەم لەگەڵا کرد.. کەچی ئەو کوڕی هەچەیە پێم ئەڵێ بڕخۆم لێدا بە ئەرزاو خۆم شەل کردو قسەم بۆ کرد تا بردمییە ژوورەوە.

سەرچڵ: ئێ دوایی؟

دڵنیا: کە لەگەڵ وتم چاک بوومەوە، هەر چاوێکی (( بە پەنجەی دۆشاومژەو ئەسپێ کوژە نیشانەی بازنە ئەکا )) ئەوەنە دەرپەڕی بوو وتی فەرموو بڕۆ ئیشمان هەیە.

سەرچڵ: تەواو قفڵ بوو.. با جارێکیتر نەتبینێ.. ئەوە بە تۆ نەکرا.

دڵنیا: نەوەڵا بابە قەتیش نامەوێ بە من بکرێ و چاوی ئەو پارەیەش دەرێ، لەوەوە دەست ئەکەوێت.. کەی بەشەرە ئەوە؟؟؟؟ ئاهـ هـ هـ!!!

Cut

دیمەنی – ١٢٠٠ –ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن و دیدەوان))

دیدەوان: نەوەڵا چۆنت پێ ئەڵێم ئاوایە.

نارەوەن: جا ئەم شەڕو تەقەیەی بۆ تێ ئەکەوێ؟

دیدەوان: چووزانم؟ ئەڵێ سروشتی ئیشەکە وایە، لەبەر ئەوەی بایی پارەیەکی زۆر قەبەیە، دزو چەتە هەوڵی فڕاندنی ئەدەن، لەبەرئەوە دنیایەک پاسەوان ئەخەنە شوێن بارەکەو پڕ چەکیشن.. ئەوی وەریشی ئەگرێ، ئەبێ هەروا بێ.. جا ئەوسا ببینە جاری وا هەیە تەماعەکە ئەوەندە زاڵمە، کابرای کە هێناویەتی چاوی بەو پارە زۆرە ئەکەوێ.........

نارەوەن(( قسەکەی لێوەرئەگرێ)): پەشیمان ئەبێتەوەو بارەکەیان ناداتێ و هەموویان ئەکوژێ.

دیدەوان: تۆ چووزانی؟

نارەوەن: ئێستا شەوانە لە یوتوب سەیری ئەو فلیمانە ئەکەم.

دیدەوان: ئیشەڵڵا لێمان هەڵئەکەوی مسیس نارەوەن هاهاها.

نارەوەن: بۆ نا؟ ئیش ئەوەندەی زەحمەتە تا دەستی ئەدەیتێ، ئیتر خۆی بەدەستەوە دێ.

دیدەوان: جا من چۆن دڵمدێ تۆ بخەمە ناو ئەو ئاگربارانەوە؟.. ئەوە بە خدر بکەین چاکە.. یان یەکێکی وەکو ئەو و کۆمەڵێک خزم و کەسوکاریش لەگەڵ خۆیا ببا.

نارەوەن(( بێزار)): بەخوا زۆر تەماعکارە، ئەویشمان لێ ئەبێ بە چەتەو سەرمایەو بنمایە هەمووی ئەباو ئەڕوا.. ئەوسا قوڕی کوێ بکەین بەسەرا؟

دیدەوان: نا وا نابێ، ئەبێ بەلانی کەمەوە من دە کەست بۆ بدۆزمەوە، بڵێی ئەمانەش سەربەخۆمن لەگەڵت دێن.

نارەوەن: دیسان هەموو شتێکت لێ تێکدامەوە.. من وامزانی ئاسانە خۆم ئەچم، کەچی هیچت تیا نەهێشتەوە، بەخوا جارێ پێی ناڵێم تا تەواو لێی دڵنیا نەبمەوە کە خێری گەورەم بەرئەکەوێ.

دیدەوان: ئەگەر حەز بکەی؟ باوک و خوشک و زاواکەی لێرە بە بارمتە ئەگرین، تا ئەگەڕێتەوە.

نارەوەن: نا توخوا ئەوان گوناحن.. چییانکردووە تێیانەوە بگلێنی.

دیدەوان: نارەوەن گیان ئەم ئیشە لە ئیشەکانیتر ناچێ بابزانی.. کەس گوناح نییە.. هەرکەسێکت بەدڵ نەبوو (( بە پەنجەی دۆشاومژە وەک چەقۆ بهێنێ بە ملی خۆیا)) پخخخخ.

نارەوەن(( ترس)): وەی کە مەترسیداری؟!!!!!

Cut

دیمەنی – ١٢٠١ – دەمەوئێوارەی درەنگ – د – کۆڵانێک:

(( لەتیف بەرەوماڵەوە ئەچێت.. دووکەس بە دەمامکەوەو بە سەیارەیەکەوە دێن و ڕێی پێئەگرن و دەمانچەی ئاراستە ئەکەن))

کەسی ١: با بمێنی، بێدەنگ سەرکەوە.

# (( ئەڵقەی پەنجاو هەشت))

**(( لەم ئەڵقەیەدا دیمەنی زوبێرو نیگار لە میوتیدا زۆر ئەبێت لە هاوینە هەوارەکان، لەبەرئەوە ٢ دیمەن کەمتر لە سەرەکییەکان دانراوە))**

لەتیف: بەڵێ باشە.

(( لەتیف سەرئەکەوێ و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٢٠٢ – ش/ن – ژوورەکەی ئەردەڵان:

(( ئەردەڵان بەناو ژوورەکەدا بە ماندوێتییەوە دێت و ئەچێ.. پاش کەمێک دائەنیشێت و ڕەوەز هەندێ عیلاج و ڕەچەتەیەکی پێیە دێتە ژوورەوە.. لە قاپی سەفەریدا شلەیەک و دووقاپ برنجی بۆ ئەهێنێ))

ڕەوەز: ها بیگرە.. ئەمە قوزەڵقورتەکەت.. (( کاغەزەکانی بۆ فڕێ ئەدا)) ئەمەش چارەسەری برین و ئازارەکانی دەعمەکەی کردت.

ئەردەڵان: دەعمی چی؟

ڕەوەز: ئەی خۆ ئیشەڵڵا ناچیتە دەرەوە بڵێی ڕەوەز تێهەڵداوم.. هەر کەسێک هات بۆ لات بەتایبەت ئەو خدرە گەلحۆیە، پێی ئەڵێی ئەو ڕۆژەی چووین بۆ خەستەخانە دەعمم کردووەو ئەوەش شوێن دەعمەکەو ئەوەش چارەسەرو ڕەچەتەی دکتۆر.

ئەردەڵان: فەرماننە بەسەرچاو.. ئەی نەک بپرسن سەیارەکە چی بوو؟ بڵێم لەگەڵ چیبیا دەعممان کرد؟

ڕەوەز: چوزانم خۆت شتێ بڵێ.

ئەردەڵان: ئەمە لە دەعمی شۆفڵ و لۆری ئەچێ، ئەڵێم لەگەڵ گرێدەرا بوو.

ڕەوەز: هەرچی ئەڵێی کەیفی خۆتە.. هیچت ناوێ؟ من تا بەیانی نایەمەوە بەلاتا دەرئەچی کەللەپووت.

ئەردەڵان: کاکە ڕەوەز خۆ پێشموتی.. بەخوا دوێنێ شەو زۆرم سەرما بوو، ئێستا شەوان ساردە.

ڕەوەز: چاوت دەرئەهات خۆ ناچم پێخەفت بۆ بێنم؟ هەر ئەمشەوە ئیدارە بکەو بەیانی ئەچیتەوە سەر دوکان.

ئەردەڵان: ئاخر بەخوا ............

ڕەوەز: زەهری مار.. بیبڕەوە خۆ مناڵ نیت، شەوێک تەحەمولکە.

ئەردەڵان: بەڵێ باشە.

(( ڕەوەز ئەچێتە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٢٠٣ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و خدر دانیشتوون.. تیرۆژو تریفە ئەچنە ژووریتر))

نارەوەن(( بۆ تریفە)): تەلەفونێ بۆ ئامۆو دەوران بکەن، خواردنەکەیان بوو بە دەمی مردوو.

تریفە(( دەنگ)): جارێ دایکە، دوایی بۆیان گەرم ئەکەمەوە، با بە دڵی خۆیان بێنەوە.

خدر: بە قسەی تریفە بکە، لێیانگەڕێ جارێ.. ڕەنگە منیش بۆ شتێکی زۆر گرنگ هاتبم نارە گیان.

نارەوەن(( بە سووکیی)): ئەو باسانە بخەرە دوایی لەبەردەرگا باسی ئەکەین، نەک گوێیان لێ بێ.

خدر(( بە سووکیی)): خۆی وتی بە پەلە ئەم بابەتە تەواوکەو ئاساییە هەمووشیان گوێیان لێ بێ.

نارەوەن: کێ؟ ڕائید کۆژین؟

خدر(( بە ئاسایی)): بەڵێ.

نارەوەن(( چاوەڕوانیی)): دەی فەرموو قسە بکە بەساقەوبم.

خدر: خۆت ئەزانی من تاقەتی پێشەکیی و شتی وام نییە، بە تایبەت لەگەڵ تۆیا کە باشم ئەناسی.. لەبەرئەوە هەر یەکسەر قسەی خۆم ئەکەم.

نارەوەن: ئەیرۆ حەمە خدر تۆ شێرو ڕێوی هێنانەوەت بۆ چییە؟ (( پێکەنین)) ئەو قسە زیادانە چییە ئەیکەی؟

خدر: دە گوێ بگرە.. بە شانازییەوە داوای دەستی تریفەت لێ ئەکەم.. داوات لێ ئەکەم بە ڕاستیی بمکەی بە کوڕی خۆت.

نارەوەن (( هەردوو دەستی ئەگرێ بە دەموچاوییەوەو دەربڕینی خۆشییەکی زۆر)): ئۆووووو حەمەخدر یەعنی ئەبی بە زاوام؟

خدر: گەر لاریتان نەبێ، تا مردن بچووکیتان ئەکەم.

نارەوەن(( بەدەنگی بەرز)) ئا وەرە تریفەی جانانە.. ئەی بۆ قسە ناکەی تا وا کتوپڕ نەبووایە؟ ڕۆڵە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە من داواکەیم قبوڵکرد.

(( تریفە بەشەرمەوە دێتە ژوورەوەو دەستی دایکی ماچ ئەکات و خدریش بەدوایا ))

خدر: پێمنەوتی هەر چاوەڕوانی ئەوەی لێ ئەکەم؟

تریفە: سوپاس دایکە!

(( تیرۆژ دێتە ژوورەوە ))

نارەوەن: جا ئەوە سوپاسی بۆ چییە کچم؟ من حەمەخدرم زۆر خۆش ئەوێ و بۆ هاوسەرگیریش خاترو خۆتری تیا نییە، ئەوەیان پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە.

تیرۆژ(( تەوقە کردن لەگەڵ خدرو تریفە ماچ ئەکا)): پیرۆزتان بێت.. لە یەکتر بحەسێنەوە.

خدر: نوخشە بێ لەتۆش تیرۆژ گیان.

(( وەلام و تریفەو تیرۆژ ئەچنەوە ژوورەوە ))

نارەوەن: ئەی زۆری ماوە دادگا بتوانێ مارەی بکا؟

تریفە(( دەنگ لە ژوورەوە )): مانگێک و سێ ڕۆژ.

نارەوەن(( پێکەنین)): سەیریکە چۆن لەبەری کردووە، ڕەنگە سەعات بە سەعات ژماردبێتی.

خدر: وایە سێ مانگە.

نارەوەن(( بە سووکیی)): ئەوەی دیدەوان؟.. خۆ ئەزانی من چۆن لای ئەو باست ئەکەم؟ چۆن ئەبێ کچت بدەمێ؟ زۆر خراپە ئێستا ئەمە بزانێ.. بەڵام ئیشەڵڵا بەم مانگ و

سێ ڕۆژە ئەویش ئەخەین بەلایەکاو دەرئەکەوێ بە نیازی چییە لەگەڵتا.. من بە باش وەسفت ناکەم.. پێویست ناکا.

خدر: بە هیچ جۆرێک.. نابێ جارێ کەس بەم داواکردنەش بزانێ ماڵی خۆتان نەبێ.. ئەگینا هەموو کەسێ ئەزانێ، تۆ کە ئاوا بە تەماعکارو خراپم بزانیت، چۆن کچم ئەدەیتێ؟.. هیچ ڕێی تێناچێ.. بەڵام ئەوان داوایان کرد زوو ئەمە ببڕێنمەوەو دڵەڕاوکێم نەمێنێ.

نارەوەن: زۆر باشە، هەروا خۆم نیشانداوە دایک و باوکیشم بە دۆلارێک ئەگۆڕمەوە نەک حەمەخدر هاهاها.

خدر: ئافەرین دەستخۆش، وابکە زۆر ئەپارێتەوە ئەوسا من بخەیتە ناوەوە.. دواتر هەر بە خاتری ئەم بابەتە، زوو کۆتاییان پێبهێنین.. کێ ناڵێ چاڵی تریشیان بەدەستەوە نییە بۆ یەکێکمان؟

نارەوەن: وایە با جارێ پەلە نەکەین تا خۆیان ئەخەنە ڕوو.

تریفە(( دێتە ژوورەوە خەندە)): ئەوە چپە چپی چیتانە، من هیچی پێ ناکەم دایە، شتی زۆر داوا نەکەی.

خدر: هەرچییەکیشم لێ داوا بکا بۆ تۆیە ئەیخەمە سەرچاوم.

تریفە: نا نا تکایە با بەدەستوری کۆنی نەکەین، دوایی شتەکان بفرۆشینەوە بە زەرەر.

خدر: خراپ تێمەگە، هەرچی داوا بکا ئەبێ خۆی بۆم بکا.. ئەی دایکم نییە؟ هههه

(( پێکەنین))

Cut

دیمەنی – ١٢٠٤ – ش/ ن – ژوورەکەی ئەردەڵان:

(( ژوورێکی ڕووتەن.. ئەردەڵان هەڵکورماوە لە سەرمایاو توند باوەش ئەکا بە خۆیا ))

ئەردەڵان: خوایە گیان زوو ڕۆژ بێتەوە، خوای گەورە لەبەر من ئەمشەو کورت کورت بکەرەوە.. بەخوا وەک شەوەکانیتر بێ، لەم ژوورە ڕووتەنەیا، سەد ڕوحیشم هەبێ، یەکیان دەرنابەم.. (( ئەگری)) ئای خوایە ڕەقبوومەوە.. توخوا فریامکەوە گەرمییەک بە بەدەنما بێنە!!!

Cut

دیمەنی – ١٢٠٥ – ش/ن – ژووری تیرۆژ:

(( تیرۆژ نینۆکی ئەخاتە بەردانی و قلقە))

<u>تیرۆژ مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

ئای لە دایکم؟! تۆ بڵێی لەبەرئەوەی من باوکمم خۆش ئەوێ جیاوازیمان بکا؟ سەیرە!! قەت دایکم وانەبووە.. یان هەر خۆی تریفەی بۆ ئەو دانابێ؟ تۆ بڵێی؟.. ئەی بۆ من بۆ وایکردو بۆ تریفەش لە خۆشیا جێ بەخۆی ناگرێ؟.. من نامەوێ بیشارمەوەو بیبوغزێنم.. ڕاستەو ڕاست پێی ئەڵێم.. ئەی چی؟

<u>مۆنۆلۆژ تەواو</u>:

________________________ Cut ____________________________

دیمەنی – ١٢٠٦ – ش/ د – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( سەیارەی ڕەوەز لەبەردەرگایەک وەستاوە.. سیارەیەک دێت و زاهیدو گوڵزاری تیایە.. لە عەلاگەیەکی گەورەیا پارەیەکیان پێیە.. ))

زاهید: فەرموو.

ڕەوەز: توشی هیچ قرەوهەرا نەبوون.

گوڵزار: نا خۆم لە پشتەوە بە ڕووتی دەمانچەکەم بە دەستەوە گرتبوو.. ئاقڵانە پارەکەیانداو شتەکەیان بردو ڕۆشتن.. ئەوەش دەمانچەکە(( دەمانچەکەی ئەداتەوە))

ڕەوەز: زۆر باشە، ئەمشەو پارەکە ئەگەیەنم و بەیانی بەشەکەی خۆتان ئەدەمێ.

زاهید: بچینە کوێ؟

ڕەوەز: ئێوە لای کابرای ورگە مردوون، لە قاوەخانەکەی خوارەوە بن، سەعات چوار ئەیهێنم بۆ ئەوێ.. وریابن لە دوکان نزیک نەکەونەوە.

هەردووکیان: بەڵێ باش.

(( زاهیدو گوڵزار ئەڕۆن و ڕەوەزیش ئەچێتە ئەو ماڵە کە لە بەردەمیا وەستاوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٠٧ – ش / ن – ژوورێک:

(( لە ژوورێکدا تەنها لەتیفی تیایەو سپیکەرێک و مایکێک دانراون.. لە سپیکەرەکەوە دەنگ ئەبیسترێت و لەتیف وەڵام ئەداتەوە))

دەنگ: ئێمە بە هیچ جۆرێک ئازارت نادەین کاک لەتیف.. تۆ پیاوێکی بەڕێزیت و خۆشمان ئەوێی.. گەر خۆشت بتەوێ کەسێ ئازارت بدا، ئەوەیان شتێکیترە.. باشترین شتێک ئەوەیە، هەر شتێکت لێ داوائەکەین جێبەجێی بکەیت و هیچیتر.. ئاسانە، ماندووت ناکەین و بە پێچەوانەوە ئەتحەسێنینەوە.

لەتیف: بفەرموون چیتان بۆ بکەم؟

دەنگ: هیچ نا.. تەنها بارەکانی کۆمپانیا مەپشکنەو تەواو.. چەندیشت پارە پێویست بوو داوای بکە.. ئێمە خزمەتت ئەکەین.

لەتیف: تکا ئەکەم تەنها ئەو داوایە نەبێ، هەرچییەکیتر بێ لە خزمەتام.. بەڕاستی بە ژیانم نەمتوانیوە ناپاکیی لەگەڵ کەسێکا بکەم، متمانەی پێم بێ.. لێتان ئەپاڕێمەوە ئەوە نا.

دەنگ: دیارە خۆت لێ زیادە کاک لەتیف.. قسەکەمان بە ڕوونیی پێ وتی.

لەتیف: ئەکرێ بەیانی چوومەوە دەست لە کارەکەم هەڵگرم؟ بەڵکو یەکێکیتر بخرێتە شوێنەکەم و ئەوەتان بۆ بکا؟

دەنگ: هیچ قسەیەکیترمان نییە.. هەر لەو ژوورەی تیایای، لەناوئەچی.. پێنج خولەک مۆڵەتت هەیە بۆ دوابڕیار.. دوای ئەوەش داوای کات مەکە.

لەتیف: کاکە.. کاکە ... کاکە! ئای خوا هاوارە.

Cut

دیمەنی – ١٢٠٨ – ش / ن – زیندان:

(( نیزام سەلامی نوێژ ئەداتەوە.. شاموراد لەولاوە نوستووە))

نیزام (( دوعا ئەکا)): خوای گەورە شەنیام بە دوور بێ لە ئافات و دەمی ئەو گورگانە.. خوای گەورە لە گوناهم خۆش بی ئیشەڵڵا، خۆم بەدەستی خۆم هاویشتمە ناو ئاگرەوە بە هۆی چاوچنۆکیمەوە، خوای گەورە بمبوریی و ئەو کچە مەحفوزکەی خوای گەورە.

(( ئەم ویردە ئەڵێ بە جۆرێک شاموراد خەبەر ئەکاتەوە))

زەللەکا زەلیلەکا

کەمبەربەستی خەلیلەکا

ئەمشەو شەوی نورانە

ڕەسوڵەڵ ڵا میوانە

لەبەردەمی دووپشک و مارو خراپەکارانە.

(( بە فوو بەرەو لایەکی ئەنێرێ))

خوای گەورە ڕەسوڵەڵ ڵا لەبەردەمی شەنیا گیانا کوێراییان دابێت و ئازاری نەدەن.

شاموراد: ئەمەیان تازە بوو ئەم دووپشک و مارو شتە.

نیزام: شاموراد بە درێژایی ئەمڕۆ ئەم ویردەم لە خەیاڵ بوو تا شەو بەسەر شەنیا گیانیا بخوێنم.. باوەڕ ئەکەی، کە مناڵ بووین لە لادێ باوک و دایکم کە ئەم وێردەیان بەسەرا ئەخوێندین، مارو دووپشکەکە بە تەنیشتمانەوە بوون پێیانەوە نەئەداین.

شاموراد: ئەی خۆ گۆرانیشیان بۆ نەئەوتن؟

نیزام: هەر گاڵتەت پێی بێ.. ئەتبینمەوە.

شاموراد: دەی کە ئەوەنە ڕوو لەخوای، بۆ ئەو کچە داماوەت لە سێبەری ئەو گورگانەیا ناشت؟ یان پارە بەری چاوی گرتبوویت و هۆشت بە دنیاوە نەمابوو؟

نیزام: زۆر لەسەری مەڕۆ شەیتان پێی کردم.

شاموراد: کورە شەیتان خواخوای بوو من و تۆ شتی پێ نەکەین.. داماوە هەر نەیئەوێرا لێمان نزیک بێتەوە.

نیزام: هەزار گوناح و یەک تۆبە.

شاموراد: بخەوە بخەوە تازە تۆبەی من و تۆ لێرە قبوڵ نییە.. پێش ئێرە ئەهێکی تیابوو. دە بخەوە دەی کاکە بهێڵە ئێمەش چاوێ گەرمکەین.

Cut

دیمەنی – ١٢٠٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی))

ڕەمزی: من وردتر سەرنجی قسەکانیم ئەدا، ئەو کوڕە توانای زوو شت فێر بوون و خۆگونجاندنی زۆر بەهێزە.

شەنیا: خۆی زیرەکە ڕاستە، بەڵام ئەو ئێوارەیە هیچی وام لێ نەبینی، ئاخۆ تۆ دیقەتی چیت دابێ.

ڕەمزی: شەنیا ئەو کوڕە ئەوروپای بینیوەو فێری زمانی ئەوێ بوو پێوەی دیار بوو.. بەڵام گوێم لێبوو یەک دوو جار بە تۆی وت، تۆ چیت غەزەب؟ وتم بەخوا ئەوە شەنیا وتوویەتی و ئەویش پێی خۆشە بیڵێتەوە.

شەنیا (( پێکەنین)): جا هەموو کەسێ هەروا ئەڵێ ئەوە چییە؟ من زوو زوو ئەیڵێم.

ڕەمزی: ئەوە بۆ من و تۆ ئاساییە چاوەکەم، کابرایەک لە ئەوروپاوە هاتبێتەوەو بە پێنج شەش ڕۆژی ئێرە فێری ئەوە بوو بێ، مانای وایە شت زوو وەرئەگرێ و ئەیەوێ بە پەلە خۆی بگونجێنێ.

شەنیا: ئەی کێ ناڵێ پێش ئەوەی بڕوا فێر نەبووە.

ڕەمزی: نەء ئەوە نییە، چونکە ئەو غەزەبە تازەکیی خەڵک بەکاری ئەهێنێ.. من دڵنیام لای ئێمە زۆر بە خێرایی ئیش شارەزا ئەبێ.

شەنیا: بە قسەی من ئەکەی وازی لێبێنە.. ڕاستە خۆ ئێمە خەڵکمان ئەوێ، بەس ئەوە داماوە، ناسکە، با توشی ئەو بەزمەی خۆمان نەبێ.

ڕەمزی: بە پێچەوانەوە من خەڵکی زیرەکم ئەوێ وەکو تۆو ساماڵ، زوو هاوسەرگیریشتان بۆ ساز ئەکەم خەمی ئەوەت نەبێ، هەر بە یەکیشەوە ئیش بکەن.. خەڵکی گەلۆرو نەزانم بۆچییە؟

شەنیا: نا نا ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟  با خۆی داوابکات، خۆ ناشزانم ئەو هەستی هەیە یان نا؟ توخوا ئەو باسە نەکەیتەوە، بەخوا ئەگینا من نابینیتەوە، هەر خۆشم ئەکوژم.

ڕەمزی: باشە جارێ زووە بۆ ئەوە.. ئەمجارەیان تۆ دەعوەتمان بکە، با جارێکیتریش ئەو غیرەت بیگرێ و دەعوەتمان بکا.. بەڵام زوو زوو، با ئاشنایەتیی زیاتر دروست بێ، باشە بەساقە؟

شەنیا(( ئامازەی وەک بڵێ دەسەڵاتم نییە)): بەڵێ باشە ئەمرەکەی.

Cut

دیمەنی – ١٢١٠ – ڕ / د – بەردەم ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر لە چایخانەکە ئەگەڕێتەوەو لەناو دەرگای ئۆفیسەوە بۆ تریفە))

خدر: بەساقە من سەرێکی ئەردەڵان ئەدەم هاتۆتەوە دوکانەکەی.. هەر چییەکت پێویست بوو لەوێم.

تریفە(( دەنگ)): باشە گیان بڕۆ، هیچم ناوێ.

(( خدر بەرەو دوکانی ئەردەڵان ئەچێت))

Cut

دیمەنی – ۱۲۱۱ – ڕ/ د – هاوینەهەوار:

(( زوبێرو نیگار پیاسەو تەماشا کردنی سروشت))

زوبێر: بوەستە با گرتەیەکی هونەری بگرم.

نیگار: ئای خوایە دیسان وێنە؟ ئەوە تۆ چی ئەکەی کابرا؟!

زوبێر: کوا چیمکردووە؟ هەندێ چرکە ساتت ڕائەگرم و پاش ماوەیەکیتر کە ئەیبینینەوە، خۆزگەی پێ ئەخوازین.

نیگار: هەموویت ڕاگرتووە.. مۆبایلەکەت پڕە لە چرکەساتی وەستاو.

زوبێر(( تورەی گاڵتە)): دە تۆ بوەستاااا! خۆ خەریکە بیرم بباتەوە.

(( نیگار بە تریقەی زۆرو پێکەنین و سەرخستن بە پشتا.. زوبێر چەند وێنەیەکی لەو کاتانەیا ئەگرێ و دواتریش وێنەیەکی وەستاو.. لەبەر خۆیەوە گۆرانی سەوزە ئای لیمۆ ئەڵێتەوە))

زوبێر: کاڵێ های لیمۆ.. سەوزە ئای لیمۆ .. من کەم شەرتم یا نە تۆ؟ خۆم ئەکەم بە قوربانی تۆ (( دوای گۆرانییەکە)) وەرە وەرە بیبینە فریشتەکەم، بزانە چی دەرچوو.

(( وێنەکانی پێ نیشان ئەداتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢١٢ – ڕ/ د – بەردەم کۆمپانیای ئاوا:

(( لەتیف لە شوێنێک دانیشتووە دەستی لە ژێر چەنەیەتی.. نینا بە بەردەمیا دێت و ئەچێتە ژوورەوە ))

نینا: چۆنی مام لەتیف، خێرە وا بێتاقەتی؟

لەتیف(( لەبەری هەڵئەسێ)): بژیت نینا گیان، وەڵا چی بێ لە تۆ نهێنی، هەست ئەکەم تۆزێک سەرسنگم ئەیەشێ و ناوشانیشم ئازارێکی تیایە. نازانم چییە؟

نینا: پشت گوێی مەخە مام لەتیف گیان، تەندروستی خۆت لە پێش هەموو شتێکەوەیە.. بچۆ خۆت نیشانی دکتۆرێک بە.

لەتیف: با کاک ئاوا بێتەوە، وا ئەکەم، بە قسەت ئەکەم.

نینا: ئاوای ناوێ مام لەتیف، بڕۆ، پێی ئەڵێم من ئیزنمداوە.. کەست لەگەڵا نەنێرم؟

لەتیف: نا دایکەکەم ڕووسپیی بیت یاخوا، خۆم ئەچم ماڵت ئاوا بێ.

نینا(( بەدەم چوونە ژوورەوەوە)): سەلامەت ئەبی ئیشەڵڵا، ڕەنگە هەر سەرمات بووبێ، هیچ نییە.

لەتیف: پەنا بەخوا.

(( نینا ئەچێتە ژوورەوەو لەتیفیش بەرەو جادە))

Cut

دیمەنی – ١٢١٣ – ڕ- عەسرێکی درەنگ / د – قاوەخانە:

(( شەنیاو ساماڵ))

شەنیا: پەیا ئەبێ.

ساماڵ: وا دیارە زۆری پێیەو کەمی دەرئەخا.

شەنیا: دەمانچەیەک هەر پێویستە، بەڵام بە هیچ جۆرێک نابێ بزانێ دەمانچە هەڵئەگری.

ساماڵ: کە هات توشی سەرسوڕمانت ئەکەم.

شەنیا: بەچی؟

ساماڵ: بە شتێک کە بە خەیاڵتا نایەت.

شەنیا: باشتر نییە بیزانم؟

ساماڵ: ئەوە هات کات نەما، ئامادەبە بۆ سوفرایزەکە.

شەنیا: هەتیو سوپ پ پرایز.. سوفرایز نا.. سوپرایز (( پێکەنینی هەردوکیان))

ڕەمزی(( دێتە لایان)): گەنجێتیش خۆشە، هەر لیقەتان دێت بۆ خۆتان.

ساماڵ: ئێمە تۆ هەر بە گەنج ئەزانین کاکە ڕەمزی، خۆتمان لێ پیر مەکە.

(( سڵاو و بەخێرهاتن))

ڕەمزی: میوانم بۆ دروست بوو، نەمتوانی ئێوارە لەگەڵتانابم، بۆیە بە شەنیام وت زووتر دانیشین، ببورن.

شەنیا: تۆ هەروای دایم دەعوەتی من ڕەت ئەکەیتەوە.

ڕەمزی: نا.. بەڵێن بێ ئەمجارە دێم و بەخۆشحاڵیشەوە، ئێستا دوانن هەر خۆت نییت قەرەج گیان.

شەنیا: جا قەرەج کەم جوانن؟

ڕەمزی: ئێ منیش ئەزانم چی ئەڵێم باوکە.

ساماڵ: من زۆرم پێخۆش بوو ئەمڕۆ بینیمیت کاکە ڕەمزی.. بەڕاستی ئەمەوێ پرس و جۆیەکت پێ بکەم.

ڕەمزی: من لە خزمەتتام، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، ئەمرکە (( شەنیا دیقەتیان ئەدا ))

ساماڵ: ڕاستیەکەی من لە ئەوروپا ناژیم. (( شەنیا چاوی لێ زەق ئەکاتەوە بێ ئەوەی ڕەمزی هەستی پێ بکا ))

ڕەمزی: ئەی پێشتر واتوت.

ساماڵ: بەڵێ، درۆیەکی سپیی بچکۆلە بوو، ڕاستیەکەیم پێ نەوتووی.

ڕەمزی: ئەی؟؟؟؟ هەر لەم وڵاتەی؟

ساماڵ: نا من لە ڕوسیا ئەژیم، ئەوروپای ڕۆژهەڵات.. لە ئێستایا کانگەی مافیاو کەڵەگاییە.. لەو وڵاتەشدا کەڵەگا نەبی، بەشی چوار ڕۆژ زیاتر ناکەی.. هاتوچوون و سەفەریشم هەر لە نێوانی ئەو وڵاتانەی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتایە.

ڕەمزی: ئەی دڵنیابم لەم قسەیە.

ساماڵ(( پاسپۆرتێک دەرئەهێنێت و نیشانی ئەدا )): ئەوەش پاسپۆرتەکەم.

ڕەمزی: وایە، ئەمەیان ڕاستە.

ساماڵ: لەوێ خەڵکی زۆرم بەدەورەوەن و ژیانم ئاسانترەو تا بڕێکی باشیش دڵنیام لە سەلامەتیی خۆم و دەسکەوتیشم لە ژماردن نایەت، ئیشی تایبەتی خۆم هەیە.

ڕەمزی: بەڵێ جا ئەمرکەو پرسیارەکەت!

ساماڵ: پێت باشە شەنیا لەگەڵ خۆما ببەم و بچمەوە بۆ مۆسکۆ؟

شەنیا: ئەو قسانە چین ساماڵ؟ بۆ کوێ بێم؟

ساماڵ: جارێ با وەکو برای گەورەی هەردووکمان پرس بەو بکەم، ئەوسا تۆ تێئەگەیەنم.

ڕەمزی: سوپاس بۆ ئەوەی ڕای منت پێ گرنگە.. بەڵام ئێمەش هەر ئەم کچە جوانەمان هەیەو پێمخۆش نییە ژیانی بخەینە مەترسییەوە، بۆیە چەند پرسیارێکت لێ ئەکەم.

ساماڵ: فەرموو.

ڕەمزی: بە هەڵسوکەوت و ڕووکەشتا وا دەرئەکەوێ لەوێ گروپی مافیاییت هەبێ.

ساماڵ: وەک گروپ نا... بەڵام ئیشمان ئەڕوا.

ڕەمزی: دڵنیاییت شەنیا سەلامەت ئەبێت.

ساماڵ: هەر سەلامەت؟.. ئەگەر ساڵێک لەگەڵما بێت و ئەوێ ببینێ، دێتەوە لێرە ئەبێ بە گەورەترین جەنگاوەریش.. لەوێ کچانێکی زۆر هەن لە مافیا ئیش ئەکەن وسەلامەتییان زۆر پارێزراوە.

ڕەمزی: نا نا نا.. تۆ زۆر سەردەرکردەو لێهاتەی.. باشە.. ئەی ئەگەر بڵێم من لێرە پێویستیم بە هەردووکتانەو ناهێڵم لە هیچتان کەم بێ، دەست لەو بیرۆکەیەت هەڵئەگری؟

ساماڵ: نازانم.. دوای ئەوەی قسە لەگەڵ شەنیا ئەکەم.

شەنیا: وەڵا هیچ حسابێکت بۆ شەنیای داماو نەکردو لە خۆتەوە بڕیار دەرئەکەی.

ڕەمزی: شتەکە بۆ من زۆر لە پڕا بوو کاکە ساماڵ.. تا ئێوە خۆتان یەکلا ئەکەنەوە، منیش بە وردیی بیرێکی لێ ئەکەمەوە، بزانین لێرە ئەتوانین چی بکەین و بە ڕۆشتنەوەشت چی ڕوو ئەدا؟

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ١٢١٤ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ بە مۆبایلەوە سەرقاڵەو نارەوەن بە لاپتۆپ تەماشای فیلمی مخدرات ئەکا ))

تیرۆژ: دایکە شتێک لە دڵما گرێیە زۆر حەز ئەکەم هۆکارەکەی بزانم.

نارەوەن: بوەستە یەک دەقە با ڕایگرم.. ئاها ئەهـ .. بیڵێ تیرۆژ گیان.. وام پەروەردە کردوون، هیچ لە دڵتانا نەهێڵنەوە، ئەگینا زۆر بمێنێتەوە بۆگەن ئەکا، خراپە.

تیرۆژ: لە بیرمە، بەڵام کاتی نەهاتبوو.

نارەوەن: دەی مادام کاتی هاتووە بیڵێ بەساقە.

تیرۆژ: خۆ کاک حەمە خدر ڕێک وەکو برای گەورەمە هیچ کێشەم لەوەیا نییە، بەڵام ماوەیەک لەمەوپێش کە هات، تۆزێک لێوم ئاڵ کردبوو، ئەزانی چیت پێکردم لەسەری؟ کەچی بۆ داواکردنەکەی تریفە یاخوا پیرۆزی یەکتر بن زۆرم پێخۆشە.. کەچی تۆ لە خۆشیا خەریک بوو باڵت ئەگرت.. جیاوازیی من و تریفە هەیە بۆ تۆ؟

نارەوەن (( هەڵئەسێ باوەشی پیا ئەکا )): کچێ وەی بەساقەی ئەو دڵە ناسکەت بم تیرۆژەکەم.. ئەوەت هەر لە دڵ گرتووە؟

تیرۆژ: هەقی خۆم نییە بزانم بۆ وات پێکردم؟

نارەوەن: با.. بەڵام کچەکەم حەمەخدرم هەرچەندە وەک کوڕی خۆم خۆش بوێ و چەند زیاتریش لێی دڵنیابم کە کوڕێکی هەزار ئەوەندەش پاکترە لەوەی سڵی لێ بکەینەوە، لە دواییا ئەویش وەک هەر پیاوێکیتر پیاوە.

تیرۆژ: ئەی ئەوە نییە لەگەڵ تریفە لە پشتی هەمووماننەوە ڕێککەوتووە؟ وایە!

نارەوەن: ئەوە داواکردنە ئاساییە کچم، هەموو کەسێ شوو ئەکات و ژن ئەهێنێ.. بەڵام من لە منداڵییەکەی تۆ ترسام لە چاو حەمەخدرا.. نەئەگونجا هاوسەرگیریی بکەن لەبەر جیاوازی تەمەنەکەتان، دوای ئەوەش تۆ بەو جۆرە بەردەوام بوویتایە لە خۆڕازاندنەوە، ئیتر وا پیاوەو غایەڵەیەک بە مێشکیا هات.. نە ئەبووایە قەت هیچ

ڕووبدا.. گەر واشبزانی درکم بە هیچی نێوان ئەو و تریفە نەکردبوو، باوەڕکە بەو چاوانەی تۆ، چەند جارێک سەرنجیانم بینیبوو، بەڵام لەگەڵ تریفە هاوتەمەنیش نەبن لەگەڵ یەک زۆریش جیاواز نیین.

تیرۆژ: ئەزانی گەر ئەوسا ئەوەت پێ بوتمایە ئاساییتر بوو.. دایکە ئێمە ڕاستە ڕای خۆمان لە ئێوە زۆر بە باشتر ئەزانین.. بەڵام باوەڕکە کە ڕێیەکمان نیشان ئەدەی وردە وردە لەگەڵ ئەقڵی خۆمان ئەیگونجێنین و دواتریش هەر ئەوە ئەکەین.. لە هەموو حاڵەتێکدا پەروەردەکەی تۆیە خۆی سەپاندووە.

نارەوەن: بەڕاستی من گلەییم لە کەستتان نییەو لە ڕەوشتی هەمووتان زۆر ڕازیم.. زۆریشم پێخۆش بوو وا کەوتەوەو تریفە بۆ حەمەخدر ئەبێ.. لەدڵەوە بەقەدەر کوڕێکی خۆم خۆشم ئەوێ.. ئیشەڵڵا بەختی تۆش وەک تریفە باش ئەبێ.

تیرۆژ: دایە گیان نەڵێی لەبەرشتێک ئەوەی وت، خوا هەردوو چاوم کوێرکا، ئەگەر لە کاکەو ئاوا کەمتر سەیری بکەم، چەند چاوم لەدوای ئەو دوو برایەمە، ئەوەندەش لەسەر ئەو.

نارەوەن: ئەوە بەڕاستتە تیرۆژ گیان؟ من بیر لە شتی وا بکەمەوە؟.. من دڵە سادەو ساکارە جوانەکەت ئەناسم باوانم.. پێویست بە ڕوونکردنەوەی خۆت ناکا.

(( حەمە خدرو تریفە دێنەوەو سڵاو و بەخێر هاتنەوە))

نارەوەن(( بەسوعبەتەوە هەڕەشە)): زۆرتان پێچوو جارێکیتر وا دوانەکەون ها !!!!!

Cut

دیمەنی – ١٢١٥ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٢١٣ – ش/ د – قاوەخانە:

(( شەنیاو ساماڵ.. ڕەمزی ڕۆیشتووە ))

ساماڵ: ئەی وایە دادەگیان ، منیش برادەرم هەیەو خەڵک ئەناسم لەملاولاوە دێنەوەو هەریەکەی چیرۆکێکی پێیە.. دڵنیابە لەو ڕۆژەوەی لەگەڵ تۆیا خەریکی ئەم بەزمەین، بەدوای هەموو گێڕانەوەکانی ئەو خەڵکەوەم، ئەمەیانم لە هەمووی بە باشترزانی کە زوو کار بکاتە سەر ئەم کابرایە.

شەنیا: هەتیو تۆش زۆڵی!

ساماڵ: نەبەخوا دایکم ئەڵێ کوڕی خۆمانی، جا گەر واش نەبێ ئەوە ئەوان ئەیزانن، ئاساییە.. وا نا؟ هههههه

شەنیا: هههه سەیری، زۆر سەیر.

ساماڵ: هەرچییەکیان بم.. گرنگ ئەوەیە وەک تۆ مرۆڤم.

شەنیا: ئەوەی تۆ کردت، ڕێک توشی شۆکیشت کردم نەک سەرسامیی.. ئەو کابرایە تەواو هەموو شتێکی لێ گۆڕا. زمانی تەتەڵەی ئەکرد، نەیئەزانی چی بڵێ هههههه. ئافەرین ساماڵ.

ساماڵ: دوای ئەوەی ئەو وا تێئەگا هاوسەرگیریی بکەین.. منیش ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەیانم بە باشتر زانی.. هەر بەڕاستی وا خەریکە خوێنی ڕامالْم بیرئەبەیتەوەو منیشت خستۆتە جیهانێکیترەوە.

(( شەنیا کە دەستی لەژێر چەنەی داناوە، چاو بە کراوەیی زەق ئەکاتەوەو بێ خەندە، تەماشای ئەکا.. بە دەلالەتی ئەوەی بیری لەو شتە نەکردبێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٢١٦ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان))

تافان(( بێ حەوسەڵە)): بێنە دەی بێنە، بەخوا هەموویم ئەدەیتەوە.. قەرزکردن دانەوەشی هەیە دەی.

هەندرێن: ژنەکە با ئەوەی بمێنێتەوە بۆ پاداشتەکە کە وەریئەگرم، بەڵێن بێ لەوە ئەویتریشت بدەمەوە.

تافان: شتی وا نییە موچەت وەرگرتووەو پارەی خۆم ئەوێتەوە.

هەندرێن: ئاخر موچەی چی؟ ئەوە بەخەرجیی و قەرزی تۆ هەمووی تەواو هیچم پێنامێنێ بۆ بەیانی.

تافان: کێشەی خۆتە کێ پێی وتووی قەرزکە؟

هەندرێن: دەی تۆ هەموو سەری مانگێک ئەم بەزمەم پێ ئەکەیت و ئیتر ئەبێ بکەومەوە قەرزت لێکردنت، ئەی چۆن قەرزارت نابم؟

تافان: دەی ئەوە ئیتر من قەرزت نادەمێ، لە کوێی پەیا ئەکەی بیکە، با ئیتر من بەزمت پێ نەکەم.

هەندرێن: ئیشەڵڵا ئەمخەیتە سەر دەست پان کردنەوە لەم و لەو؟!

تافان: وەڵا ئیتر کەیفی خۆتە، لەمەولا هیچ لە من هەڵناکڕێنی.

هەندرێن(( تووڕە)): دەوەرە ئیمان لەسەرتا بمێنێ!

(( مناڵەکان دێنە ژوورەوە))

کڵپە: چییە بەزمە دیسان ؟ هەڵپەڕین؟

تافان: باوکتان نییە دایمە بەزمی پێیە؟

باڵا: باوە گیان قەینا من شتێکم کۆکردۆتەوە، ئەتدەمێ.

تافان: بە بیللاهی بیددەیتێ ئیتر من هیچت نادەمێ.

هەندرێن: ئا ئا ئا لەو پیسییە؟ تۆ بەناوی ئەوانەوە پارەم لێوەرناگری بۆ خەرجییان؟ ئیتر حەددت چییە نایاندەیتێ.

تافان: ئیتر ئاوایە، بۆ خۆت پەیایکە.

هەندرێن (( زۆر توڕەو دان بەخۆدا گرتن)): کێشە نییە، هەرچۆنێ بێ ئەم مانگەش بەڕێ ئەکەم، بەڵام لە مانگی داهاتووەوە، خەرجی لای تۆ نامێنێ.. شتێکی کەمت ئەدەمێ بۆ خۆت و خۆتی پێ بگوزەرێنە.

تافان: ئای وا ئەزانی بە دەست خۆتە.. ئەوە ڕێککەوتووین لەسەری و تەواو بووە.

باڵا: توخوا باوکە بچۆ ئەودیو با نەبێ بەشەڕ دیسان.

کڵپە: ئەمە بۆیە منیان ناوناوە کڵپە، چونکە دایم کڵپەیان ئەگرن.

(( هەردوو منداڵەکە باوکیان هەڵئەسێنن و دەستی ئەگرن بۆ ژوورێکیتر))

Cut

دیمەنی – ١٢١٧ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( دیدەوان و ڕەمزی))

دیدەوان: با تۆزێکیتر بچینە پێشەوە باشترە، لە هەوڵی زۆری ڕازیی کردنی منداڵەکانایە، ئاگادارم.

ڕەمزی: ئاگاداری ناوماڵیشیت یان خۆی ئەیڵێ؟ ئەگەر خۆی بیڵێ زۆر جێی متمانە نییە، هەرچەند بێ ئەقڵیشە.

دیدەوان: نا نا، دوێنێ خدرەکە هات بۆ لای، لێی ئەپاڕایەوە ئەو ئاوایان قەناعەت پێ بکا، چونکە پێی وتووەو زۆر خراپ ڕەتی کردۆتەوە.. خۆم گوێم لێگرتن.. هههە خدریش ئەیوت بەخوا ئاوا زۆر سەرسەختە.. ئەبێ هێواش هێواش لەگەڵی بڵێی.

ڕەمزی: کەواتە هیچ؟!

دیدەوان: نەخێر هار بووە بۆ پارەی من، وتی بە ئاوا بڵێ وا نەکا ئەو پێی خۆش بێ و پێی ناخۆش بێ هەر شووی پێبکەم، تازە گفتم بەو پیاوە داوەو دوو مانگەکە تەواو بێ، ئیتر هاوسەرگیرییەکە ئەکەین، کێ زۆریشی پێ ناخۆشە با هەر لە ورگی خۆی با.. بە پیرییەکەما تێمەکەوە ڕەمزی، خۆم ئەزانم چۆن وای لێ بکەم شەرم لەسەر بکا.

ڕەمزی: وەڵا دەستخۆش هەزارجار ئافەرین، ئەو ژنەی لەسەرەتاوە ئەوەندە ڕقی لێت بوو، چۆنت گۆڕی؟!!.. دەستخۆش.

دیدەوان: وای لێ ئەکەم ببێ بە کۆیلەی خۆم.. پەلەت نەبێ.. بە عینادیی ژنانا تێنەکەوی، هەندێجار درۆزنانەیە.. ئەیەوێ زیاتر شەیدای خۆیت بکا.

ڕەمزی: بەڵام وریای ئاوایان بە زۆر تەواو نییە، شێتە.. هەرچییەکت کردووە وا بکە ڕەزای ئەوی لەسەر بێ.

دیدەوان: خدر وتی من هەوڵی تەواوی لەگەڵ ئەدەم، خۆم ئەزانم چۆن ئەیگرم.. با بزانین چی ئەکا؟.. بەس جارێ بە حسابی خۆی نایەوێ من ئەو شتانە بزانم، ماڵەکەی خۆیم وا بۆ باس ئەکا، کە هەموو ملکەچی فەرمانی ئەو بن.

ڕەمزی: تەنها ئەو هەتیوەیان کێشەیە.. ئەو ڕۆژە زۆر خراپی بە ڕەوەز کردبوو، بۆم گێڕایتەوە.. بەڵام ڕەوەز زۆر دڵ پڕ لەقینە، ئەڵێ مادام بە دارەوانەوە پۆزم بەسەرا لێئەدا.. ئەبێ ئەو دڕکەی هەر لەژێر پێیا دەربێنم.

دیدەوان: نا نا بڵێ هەڵەی گەورەی لەگەڵا نەکا، کوڕی دارەوان و ژنە تازەکەمە، هاهاها.. کورە چی لێ ئەکا با بیکا، یاڵڵای ئەکرد لە کۆڵانێکا ساردی ئەکردەوە.. بەیانی ئەوەی وتم بۆ خدرەکە، جێبەجێی بکەن.. ئیتر دوا تێستیەتی، بزانن کاردانەوەی لەسەر بەڵای ناگەهان و لەپڕ چۆنە؟

ڕەمزی: سەرچاو.. بەڵام بۆ باسەکەی ئاوا، تۆ ڕەوەزی لێ هان مەدە، خۆم جۆریان ئەکەم، وا بێ ڕەوەز دڵی ئاو بخواتەوە.

دیدەوان: کورە من لە کوێ ئەمپەرژێتە سەر ئەوە.

Cut

دیمەنی – ١٢١٨ – ڕ/ د – سەر ڕێگەی دەرەوە:

پێشنیازی یەکەم:

(( هەندێک دیالۆگ و دواتر سەرەتای وەرگەڕان یان پێکدادانی سەیارەی زوبێرو نیگار))

پێشنیازی دووەم:

(( بە تەلەفون دەوران ئامۆ ئاگادار ئەکاتەوە لە ڕووداوەکە))

Cut

دیمەنی – ١٢١٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو تریفە.. خدر تێلی بۆ دێت.. تەماشای ئەکا ))

خدر: کاکتە..(( تریفە بە ئاماژەی ئەوەی تێگەیشت)) بەڵێ کاک ئامۆ گیان...... سوپاس قوربانت....... چۆن؟؟؟؟؟؟؟ .......... ئەوە بەڕاستتە؟؟؟؟؟؟ ................. ئاااااای بەداخەوە ................. ئەی ماون؟

تریفە: چی بووە؟ چی ڕوویداوە؟

خدر(( بۆ تریفە.. بەدەست ئاماژەی ئەکا بوەستێ پەلەنەکا)): ئێستا بێینە کوێ؟ .............. تریفەش بێنم؟ ............ هەر ئێستا، دە دەقەمان پێ ناچێ، ئەگەینە لاتان.......... خوات لەگەڵ. (( بۆ تریفە)) کاک زوبێرو نیگارخان وەرگەڕاون.

تریفە: چیییییی؟ کەی؟

خدر: نازانم هەستە با بگەینە لای دایکت و ئەوان.. بچین بەرەوپیریان، ئەوانیش نازانن ماون یان مردوون.. ئەڵێ خەڵکی ئەو دەوروبەرە بەرە ئەمبۆلانسیان بۆ بانگ کردوون و وا بەرەو ئێرەیان ئەهێننەوە.

تریفە: ئای خوایە گیان لەم بەڵایە، یاخوا هیچیان بەسەر نەهاتبێ خوایە گیان، مەرێکم مەولوی پێغەمبەر بێ سەلامەت بن.. ئەی کێ لێرە بێ.

خدر: دایئەخەین کێشە نییە، ئەبێ هەندرێنیش بەرین.

(( بە پەلە ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٢٠ –ڕ/د – دوکانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان لەبەر دوکانەکەی کورسییەکی داناوەو دانیشتووە، تەماشای دەوروبەر ئەکات و سەرنجی ئەچێتە سەر دووکەس پێک هەڵئەپژێن لەبەردەمی ئۆفیسی وەکالەتدا ))

<u>ئەردەڵان مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:</u>

ئەوە ئەو دوو بێ مێشکە خەریکی چین؟ توخوا ئەم ڕۆژگارە کاتی شەڕە مردووتان مرێ.. ئای خوایە بێ ئەقڵیش چەند زۆر بووە.. ئا ئا.. خۆ تالیبەری دەرهێنا، ئەوە چی ئەکا؟

<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:</u>

ئەردەڵان: خۆ بەریکەوێ ئەیکوژێ.. ڕەنگە حەمەخدری لێ نەبێ، ئەگینا هەر ئەهاتە دەرەوە بۆ ناوبژییش بێ... کورە بەزاتی خوا ڕەنگە تەڵە بێ بۆ حەمە خدر..

# (( ئەڵقەی پەنجاو نۆ))

بۆ نەچم؟ نەک تالیبەرێکی پیاکێشن.. (( هەناسە هەڵکێشانێک)) ئەم کابرایە منی لێرە بەستۆتەوە، ئەڵێ هەر بچیتە لای یەک کەس، قاچت ئەشکێنم... ئا ئا ئا خۆ شوشەی جامخانەکەی خدریان وردوخاش کرد.. باوکم بیلاهی یا من ئەقڵم نییە، یان ئەم بەزمە بۆ حەمەخدر سازکراوە.. بەخوا ئەچم ئەگەر بشمکوژێ.. یا الله!

(( هەڵئەسێ و بە خێرایی بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەچێ..))

Cut

دیمەنی – ١٢٢١ – ڕ/ د – سەرڕێگەی دەرەوە – تاسڵوجە بۆ نمونە:

(( سەیارەکانی ئامۆ، نارەوەن، ڕەمزی، شەنیا، ئاوا، خدر، بروسک، دوو سێ سەیارەیتریش وەستاون.

کەسەکان: ئامۆ، خدر، تریفە، ڕێژوان، سەلوا، چیمەن، هەندرێن، بروسک، ئاوا، نینا، نارەوەن، ڕەمزی، شەنیا، دەوران، دڵنیا، دووسێ کرێکاری کارگەو چەند ئەفەنییەک.

دیمەنەکە: شین و شەپۆڕی دەوران و چیمەن و سەلواو ڕێژوان و پەستیی و بێتاقەتیی ئەوانیتر، فرمێسکی نارەوەن و ڕێژوان و بروسک.

پاش کەمێک ئەمبۆڵانسێک دێت و ئەمانیش کە لە دوورەوە ئەیبینن، بەپەلە سواری سەیارەکانیان ئەبن و دوای ئەمبۆڵانسەکە ئەکەون))

Cut

دیمەنی – ١٢٢٢ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان دانیشتوون، یەک دوو کەسیتریش هەن))

ئەردەڵان: یەعنی کاک زوبێر مردووە؟

هاوڕێ: نا، بەڵام کەس بە تەمای نییە، ئەڵێن وەزعی ژنەکەی باشترە، هەرچەند ئەویش هەر بێهۆشە، بەس مێشکی سەلامەتە،

ئەردەڵان: جا ئەسسەح وایە؟

هاوڕێ: وەڵا ئیتر وا ئەڵێن من چووزانم، حەیف بۆ مامۆستا.

ئەردەڵان: ئەرەوەڵا هەزار حەیف.. باشە ئێستا چی لەم دووکانە بکەین؟ هەروا کراوە بێ؟

هاوڕێ: وتی شووشەچییەک بانگکەن و شووشەیەکی وەک خۆی تێگرنەوە، مادام دووانەکەش لە پۆلیسن، دووایی خۆم ئەچم ئەیانبینم.

ئەردەڵان: ئەی لەسەرچی وەستاوی؟

هاوڕێ: لەسەر پێی خۆم، نایبینی؟

ئەردەڵان: هەتیو ئەڵێم ئەی بۆ شووشەچی بانگ ناکەی؟

هاوڕێ: چووم پێموتووە، ئەڵێ لای ئێوارە دێم ئیشم زۆرە، ئەوناوە کەسیان مەجالیان نەبوو بێن.

Cut

دیمەنی – ۱۲۲۳ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری ئامۆ:

(( نارەوەن و ئامۆو ئاواو نیناو خدرو تریفەو بروسک))

نارەوەن: ئەی کچەکەی باش ئەبێت؟

ئامۆ: خۆی هەر دڵی لاواز بوو، بەڕاستی خراپیان کرد لە پڕا پێیانوت، نەئەبووایە وا لە پڕا پێی بوترێ، هەر گەیشتنە ئێرە لەگەڵ کاک زوبێرو نیگارخانا، ئەویشیان بە پەلە فڕاندە بووژانەوە.

نینا: خوا ڕەحمیان پێ بکا، لە چاوەڕوانیی کەسا نەبوو.

تریفە: مانگی هەنگوینییەکەیان پێوە نەهات.

بروسک: هەر خوا بکا دکتۆرەکەی مێشک زوو بڕیار بدا باشە.. ۱۲ سەعاتی داناوە.

ئامۆ: بێخەمبە کاک بروسک، زۆر شارەزایە، ئەڵێ کێشەکە ئەوەیە کاک زوبێر سێ دڵۆپ خوێن ڕژاوەتە ناو مێشکییەوە، خوا ڕەحمی پێ بکا، ئیشەڵڵا نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو ئەبێ.

بروسک: ئەی چیمەن؟

ئامۆ: دکتۆرەکەی ئەڵێ سەلامەت ئەبێ.

نارەوەن: یاخوا نیگاریش باش بێت.

ئامۆ: نیگارخان باش ئەبێت، مێشکی سەلامەتە، بەڵام شکاویی زۆر زۆرە.

ئاوا: لەتیفیش لە بوژانەوەیە.

ئامۆ: ئەو باشە.

خدر: وا زوو ئەنجامێک دەرئەکەوێ؟

Cut

دیمەنی – ١٢٢٤ – ش/ن -ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و دیدەوان))

دیدەوان: دەی ملیان شکێ، نەئەبووایە بزانن کابرا لەوێیە یان نا؟ ئەوسا هاڕەیان بە شووشەی بکردایە؟

ڕەمزی: جا ئەمان چووزانن ئەوە ڕووئەدا؟ من بەیانییەکەی پێموتن ئەوە بکەن و کردیان، بەڵام ئەمە چەند جارێکە ئێمە شتێک ئەکەین ئەو کابرایەیە بخەینە ناوەوە، کەچی لەوکاتەیا شتێک ڕووئەداو لەوێ نابێ، زۆر سەیرە.

دیدەوان: باوەڕت بەو شتانە نەبێ، ڕێککەوتی نەکردووە، بۆ جارێکیتر، بلێ دڵنیا بنەوە لەوێیە، ئەوسا ئیشەکە بکەن.. ئەی نیگار ئەمێنێ؟

ڕەمزی: بەڵێ ئەمێنێ، ڕاستیەکەی حەزم ئەکرد کەمێک دوورکەوێتەوە، بۆ ئەوەی کاتی زیاترم لەگەڵ شەنیا هەبێ لە کارگەو ئەو هەتیوەش بێنینە ناوەوە، زۆر شارەزا دیارە، پێئەچێ مافیاش بووبێ، لەو وڵاتانە.. ئێستا کاتیەتی زۆر باشە.

دیدەوان: ئەی ئەگەر بمردایە؟ چۆن ئەوەت کرد؟

ڕەمزی: ئەوسا ئەمانوت خوا عافویکا، ئەی چی لێ بکەم، ئۆفیسەکەی چۆڵ نەئەکرد.

دیدەوان: جوانییەکەی ئەوە بوو ڕەحمت پێ نەکردو لەوپەڕی خۆشیا ئەوەت بەسەر هێنان.

ڕەمزی: چەند ڕۆژێکی باش پێکەوە بوون هاهاها بەسیانە.. حەز ئەکەی نارەوەنیشت لەوکاتەیا بۆ فت ئەکەم.

دیدەوان: ئەگەر خۆشدەست بێ، با بۆ خۆی بلەوەڕێ جارێ.

ڕەمزی: ئای سەرۆک بۆ خۆت چۆنی هههە؟ بۆ خەڵکیش هیچ گوێ نادەیتێ.

دیدەوان: خۆم و خەڵک نییە ڕەمزی گیان، تۆ ئەزانی من باکم بە ژیان و خۆشیی هیچ کەسێک نییە، هەر لەبەرئەوەش نەمویستووە قەت منالم هەبێت.. ماوەیەک لەگەڵیان

ئەژیم و دواییش کەی تاقەتم لێیان چوو، شۆڕیان ئەکەمەوە بۆ ناو ماڵە هەمیشەییەکەیان.

(( پێکەنینی هەردووکیان))

Cut

دیمەنی – ١١٢٥ – ش/ د – نەخۆشخانەی زوبێر:

(( ئاواو ئامۆ لە شوێنێکا وەستاون))

ئامۆ: هەموویم جۆر کردووە خەمت نەبێ، هەموو تەبەڵەو پێداویستیی و چارەسەرەکان هی جەڵتەیە.

ئاوا: دەستخۆش.. دڵنیام خەڵک ئەنێرن بزانن جەڵتەکەی ڕاستە یان نا؟

ئامۆ: هەهە لە ڕاستیی ڕاستترە خەمت نەبێ.. ئەی کە بە حساب چاکبۆوەو چووە دەرەوە، لێی ئەگەڕێن؟

ئاوا: ناهێڵم بێتەوە کۆمپانیا، ئەڵێم لەماڵەوە دانیشەو مانگانەی خۆت مسۆگەرە.. کورە ئامۆ ئەوەی مام لەتیف بۆ منی کردووە، هەر کەسێکیتر بووایە ئەو هەموو پارەو تۆقاندنە کاری تێ ئەکرد.. ئەو هەر بەیانی کە گەڕایەوە، لە نوکەوە بۆی گێڕامەوە چییان پێکردووە.

ئامۆ: شایانیەتی منیش درێغی لێ ناکەم، بەس ئەمڕۆ ئەیوت کاک ئامۆ بە گاڵتە گاڵتە توشی جەڵتەی ڕاستیش نەبم هەهە.

ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ١١٢٦ – مربوط – ش/ د – بەردەرگای نەخۆشخانە:

(( هاوڕێ و ئەردەڵان و ئەحەو کارە وەستاون، پرسگە قسەیان لەگەڵ ئەکا ))

پرسگە: براکەم بەخوا سوودی نییە، هەردووکیان لەهۆش خۆیان چوون.. با یەک دووانێک بێتە دەرەوە، بەسەرچاو ئێوەش ئەکەمە ژوورەوە.

ئەردەڵان: بەخوا من زۆرم درەنگە کاکە، ئەوە کاک ئاواو کاک ئامۆن، ئەچم سەرێکی ئەوان ئەدەم و هەرکاتێ خۆت وتت سوودی نییە، خۆ ئەوان ناتوانن قسەمان لەگەڵ بکەن.

هاوڕێ: دە منیش هەر بۆ لای ئەوان ئەچم.

پرسگە(( بۆ کارەو ئەحە)): ئەی ئێوە؟

کارە: ئێمەش مامەخدر ببینین بەسە.

پرسگە: دەی گەروابێ بچنە حەوشەکەوە، تکایە با بەردەستی دکتۆرەکان نەگیرێ مەچنە ژوورەوە.

هەموو: نا نا ناچین.

Cut

دیمەنی – ١٢٢٧ – ش/ن – قاوەخانە:

(( زاهیدو گوڵزارو ڕەوەز))

ڕەوەز: نا نا ئاقڵم کردووە، ئێوەشم لای مراندووە.

گوڵزار: پیاوێکی چەند ڕووح سووک و دەبەنگ بوو خوایە هههه لێرە زرمەم لێ هەڵئەساند لەولا هەڵمئەخەڵەتاندەوە، خۆش ئەوە بوو یەکسەر باوەڕی پێ ئەکردمەوە.. هههه بەخوا پیاوی واش خۆشە.

زاهید: ئەو تێپەڕی تەواو، ئێستا باسی ئیشی تازەمان بۆ بکە ڕەوەز.

ڕەوەز: دووان هەیە.. یەکێکیان وڵاتانیتریشی تێ ئەکەوێ.

گوڵزار: کە خۆشە.

ڕەوەز: ئەو خۆشە جارێ پێ نەگەییوە.. ئەویتریشیان، گوڵزار بە تۆ ناکرێ، کچێکیترم پێویستە.

گوڵزار: بۆ؟

ڕەوەز: نزیکی کابرای دەبەنگ و لای ئاواکەیە، ئەوی هەر نەدیوو و نەناس ڕقی لێت ئەبۆوە.

ڕەوەز: چاوی دەرئەهات.. منیش حەزم لەو دەوروبەرە نییە.

ڕەوەز: کەسێکی جوانکیلەت پێ شک نایات؟

گوڵزار: ناوەڵا من هەر خۆم شک ئەبەم هههها!

زاهید: جۆری ئیشەکەم پێ بڵێ، ئەگەر زانیم لە توانای ئەو خاڵۆزایەمایە کە وتم زۆر نەبوون، هەوڵی لەگەڵ ئەدەم.

ڕەوەز: ژەهرم بۆ بخاتە خواردنی ژنەکەی ئاواوە.

گوڵزار: واو شتی چۆن شک ئەبەی؟

زاهید: چەندی ئەدەیتێ؟

ڕەوەز: هەرچەند داوا بکا، گرنگ ئەوەیە داخێکم بۆ بنێ بە جەرگی ئاواوە، تا مردن بیری نەچێتەوە، چونکە بە ژیانم ئەو سوکایەتییەی ئەوم بیر ناچێتەوە.. با بزانی، تا مردنیش کۆڵی لێ نادەم.. لە هەموو بستە ڕێیەکی ژیانیا، داخێکی تازەی پێوە ئەنێم.

گوڵزار: خۆشم ئەوێیت ڕوح! ئەبووایە تۆ سەرۆک بوویتایە.. منیش ڕقم لێیەتی، هەر زۆریش.. خۆزگە لەناویشت ئەبرد.

ڕەوەز: نا گوڵە گیان، لەناوبردن یەکجارەو ئەبڕێتەوە.. بەڵام بەم ڕێگەیەی من، هەر ماوەیەک جارێک ئەیکوژم.. ئەوە ڕای ئەوانیتریشە.

زاهید: باشە، لەم یەک دوو ڕۆژەیا ئەچم قسەی لەگەڵ ئەکەم و لەو بڕوایەشدام بیکا.

ڕەوەز: ئەویش نەبوو بە پەلە یەکێکیترم بۆ بدۆزنەوە، ڕێگەی جێ خۆ کردنەوەشی لە کۆمپانیاکەدا ئاسانە، هەر ئەوەندەی لەتیف هەستێتەوە سەرپێی خۆی.

زاهید: جەڵتەیە؟

ڕەوەز: یەکێکم نارد سەیری فایلەکەی کرد لە نەخۆشخانەکە، بەڵێ، کوڕی نازانم چییە کە زانی ئەبێ خیانەت لە ئاوا بکا، ئەوەندەی پیش لێ خواردۆتەوە، توشی جەڵتەی کردووە.. بەڵام چاک ئەبێتەوە، وتیان وەزعی زۆر خراپ نییە.

گوڵزار: ئای خوایە چەند بێ مێشکە، ئاخر ئاوای چڵێت چییە خۆتی بۆ توشی کێشە بکەی؟

Cut

دیمەنی – ١٢٢٨ – ش / ن – نەخۆشخانە – ژووری نەخۆش:

(( نیگار دەست و قاچ و ملی پێچراوەو بێهۆشە.. دەوران و تیرۆژو شەنیا بەدیاریەوەن.. دەوران هەر ئەگری و لە باوەشی تیرۆژا.. تیرۆژ دەست بەسەریا ئەهێنێ و دڵنەوایی ئەکا.. پاش کەمێک ساماڵ دێت و سڵاو و نزای باش بوون و وەڵامی ئەوان))

شەنیا: دەوران گیان وا تیرۆژخانی خوشکتت لایە.. ئەگەر ئیزنی من بدەی ئەو هاوڕێیەم هاتووە.

دەوران: تۆ بڕۆ بەساقەوبم، زۆر ماندوو بوویت، ئەرکت کێشا.

شەنیا: نەبابە ئەرکی چی؟ بەخوا بەقەدەر دایک بۆ منیش بوو، کوێراییم داببهاتایەو ئەمەم نەبینیایە.. (( بۆ تیرۆژ)) تۆ ئەمشەو لای ئەبی بەقوربان، یان بێمەوە؟

تیرۆژ: نەبابە هاتنەوەی چی؟ بۆیە درەنگ هاتم تا شەو لای بم، دەورانیش ئەنێرمەوە.

دەوران: بەخوا تا بە پێی خۆی نەیبەمەوە دەرەوە ئێرە چۆڵ ناکەم.

شەنیا: دەی خوا شیفای با.. ئیشەڵڵا هیچ نابێ و زوو هەڵئەسێتەوە.. من بەیانی دێمەوە دەوران گیان.. بەڵکو تا دێم چاوی کردبێتەوە.

(( ئیزن وەرگرتن و چوونە دەرەوەو خواحافیزیی.))

Cut

دیمەنی – ١١٢٩ – ش/ن – ژوورێکی چۆڵ:

(( مام لەتیف دانیشتووە، خواردنێکی چەورو باش ئەخوات و دواتر کارگوزارێک دێت قاپەکان بباتەوە))

کارگوزار: تەواو بووی قوربان؟

لەتیف: بەڵێ گیان، دەستتان خۆش بێ، توخوا تۆزێ زوو چاکەشم بۆ بێنی، خەریکە سوێم بێتەوە بۆ جگەرە.

کارگوزار: بەسەرچاو هەر ئێستا.

لەتیف: خۆ کەس نەهاتووە بۆ لام؟

کارگوزار: کەس نەهاتووە، نا.. ئەگەر هاتیشن، ئەڵێین چووە بۆ ئیکۆ.

لەتیف: باشە قوربانی ئێوە.

Cut

دیمەنی – ١٢٣٠ – ش/ن – سالۆنی بەر ژووری نەخۆش:

(( هەندرێن و تافان وەستاون.. ڕێبواری تەمەن ٤٠ بۆ ٤٥ ساڵ، سمێڵ ڕەشی گەورە.. پشتی لەوانە، گسک ئەدا.. جلی قاوەیی کارگوزار))

هەندرێن: بە منالەکانت بوتایە باش دەرگا داخەن.

تافان: خۆیان ئەزانن خۆ منالْ نیین.

(( سەلوا دێتە دەرەوە بە خێرایی.. ))

هەندرێن(( بە پەلە)): ها سەلوا کاک زوبێر چۆنە؟

سەلوا(( پەلەو هەناسەبڕکێ)): باری تێکچوو، بە پەلەم ئەچم بە دوای دکتۆرا.

هەندرێن(( بۆ تافان)): ئێستا دێمەوە.

(( سەلواو هەندرێن ئەڕۆن و ڕێبوار دێتە لای تافانەوە بە خێرایی))

ڕێبوار: لای کاک ڕێشارەوە هاتووم، ئەمانزانی دێیتە ئێرە، سڵاو و ڕێزی هەبوو.

تافان: ئەی توخوا وەزعی چۆنە؟

ڕێبوار: کاتی ئەوە نییە (( نامەیەک دەرئەهێنێ)) ئەم نامەیە بشارەوە بۆی ناردوویت.. ژمارەی منیشی بۆ نوسیوی، ئەگەر مەبەستت بوو پەیوەندیم پێوە بکە.

تافان: تۆ هەر لێرەیت؟ (( ئەیەوێ نامەکە بخوێنێتەوە))

ڕێبوار(( توڕە)): هەڵیگرە.. ئەوە چی ئەکەی؟ ئێستا دێنەوە.. (( بە پەلە نامەکە هەڵئەگرێت)) نا من لێرە نیم، تەنها بۆ گەیاندنی نامەکە هاتووم.. من ئەڕۆم.. دواتر خۆم پێت ئەڵێم چی ئەکەی ئەگەر حەزت لە ئیشە.

تافان: ئیشی ڕێشار سەرسەرم، ئەی چۆن حەزم لێی نییە.

ڕێبوار: خواحافیز تافان خان.

تافان: خوات لەگەڵ.

(( ڕێبوار بە خێرایی و دواتر کە سەلواو هەندرێن و دکتۆر ئەبینێ بە پەلەدێن.. بەدەم گسکدانەوە ئەچێتە دەرەوە.. تافان هەڵئەسێ و لەگەڵیانا ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٣١ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( خدرو بەهێز))

بەهێز: لە مانگی داهاتوودا.

خدر: هەرچەند من لەگەڵ سێدارەیا نیم وەک بیروباوەڕ.. بەڵام هەندێک کەس دەرفەتی چاکبوونیان نییە بەڕاستی.. یان گەر ئازادیش بکرێن.. کەسوکاری قوربانییەکان ناهێڵن بژین.. خۆ خەڵکەکە پارەی خۆی وەرگرتەوە؟!

بەهێز: بەڵێ، بەڵام کەل بوو، بە ناچاریی بە ڕێژە ئەو کورتهێنانە بەسەریانا دابەش کرا.

خدر: دەسەڵات نییە، چی لێ ئەکەی؟ دادپەروەریی زیاتر تیایە.

بەهێز: ئەی لەم دووە خۆش ئەبی؟ ئێمە لیستی زیانەکان و جێی ڕووداوەکەمان هەر دوێنێ تەواو کردووەو ئامادەیە.. ئیتر ئەمێنێتەوە سەر خۆت.. لەدوێنێوە لەسەر فرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە ڕاگیراون.

خدر: ئەی چییان لێ بکەم کاک بەهێز؟.. دوو گەنجن و بەیەکا هەڵپژاون و من زیانم بەرکەوتووە، منیش هەر دوێنێ بەو کوڕانەی ئەوێم وت چاکی بکەنەوەو کێشەی نەماوە ئێستا.. بەڵام گەر یەک دۆلاریشی تێچوو بێت مانای وانییە بڵێم گەردنتان ئازاد بێ، ئەویش هەر وەک ئاقڵکردنیان، با لەخۆیانەوە بەیەکا هەڵنەپژێن.

بەهێز: هەقی خۆتەو دەستیشت خۆش بێ، منیش لەگەڵتام.. چەندی تێچوو؟

خدر: ٢٢٠ دۆلار.

بەهێز: زۆر باشە، لیژنەیەکی خەملاندنت بۆ ئەنێرین و پارەکەشیان لێوەرئەگرینەوە.. ئەگەر لێیان خۆش ئەبی، لای ملازم ئاری ئیمزایەکیان بۆ بکەو ئێمە ئیشێکیترمان نییە. ئەتوانی بفەرموویت.. ببورە بە ئاگاداریی بانگکرایت، خۆت ئەزانی ئەوە کارڕاییە. ______ Cut ______

دیمەنی – ١٢٣٢ – ڕ/ د – بەردوکانی شیرینیی:

(( ڕەوەز دێتە بەردەمی ئەردەڵان و ئەمیش لەبەری هەڵئەسێ))

ڕەوەز: بێ پرسی من چووی بووی بە شایەت لەسەر ئەو دووەی شووشەی جامخانەی خدریان شکاند.. جارێکیتر هەرچی ڕوویدا بە تەلەفونێک ئاگادارم ئەکەیتەوە.. نامەوێ دووبارەی کەیتەوە.

ئەردەڵان: بەسەرچاو کاکە ڕەوەز گیان.. ئاخر بۆیە چووم، نان و نمەک لە نێوانمانا هەیە، پێم عەیب بوو تەماشاچی بم.

ڕەوەز: باشت کرد بۆیە ناتبەمەوە بۆ تێهەڵدانەکە، باوەڕ بکە خراپ بووایە ئێستا لە ژێر هاژوهوژی قامچیا ئەبووی.

ئەردەڵان: بۆچی باش بوو کاکە؟

ڕەوەز: تا خدر بزانێ هیچت لەگەڵیا نییەو نێوانتان بەردەوام ئاساییە.. با زوو زوو سەردانیشت بکا.. ئێستا ئەو منەتباریشە.

ئەردەڵان: ئەی منیش بچم بۆلای ئەو؟

ڕەوەز(( بەدەم جێهێشتنیەوە)): حەددت نەبێ.

(( ڕەوەز ئەڕوات و ئەردەڵان بێتاقەت))

Cut

دیمەنی – ١٢٣٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( ڕەمزی و شەنیا ))

ڕەمزی: بیلِلاهی فیشەکیشت تیا خەسار ناکەم، دەست ئەنێمە بینت تا ئەتۆپی، ئەگەر دڵیت یەشاندبێ؟

شەنیا: نەبەخوا، نە بە قەبری دایکم، هیچ شتێ نەبووە، بەس خۆی وتی ئەگەڕێمەوە.

ڕەمزی: ئاخر چوزانم دەستی تۆی تیابێ؟ چونکە تێبینیی ئەکەم تۆ پێت خۆش نییە ئیشمان لەگەڵا بکا.

ڕەمزی: قەت وا مەڵێ کاکە، جارێ ئەوەندە نزیکی من نییە تا کە تیا بچێ یان نا خۆمی بۆ لە خوم بگرم، ؟ ئیتر بۆ حەز ناکەم؟

ڕەمزی: داوای پەیوەندیی لێ نەکردووی؟

شەنیا: ئەیەڕۆ، نەبەخوا، پێمنەوتی ئەگەر داوای کرد یەکسەر پێت ئەڵێم؟

ڕەمزی: کەی بە نیازە بڕوا؟

شەنیا: دوو بەیانی.

ڕەمزی: باشە عەسر لەگەڵی دانیشەو خۆت داوای من بکە بێم، با ئەو نەزانێ مەبەستمە ببینم.

شەنیا: بەسەرچاو، هەرچەند وام نیشاندا پێم ناخۆشە ئەڕواتەوەو خۆم لالووت کردووە، بەڵام بۆ ئەوەی تۆ دڵت پاک بێتەوە ئەوە ئەکەم.

ڕەمزی: نیوەڕۆ بچۆ سەرێکی نیگاربەو لەوێشەوە خەریکی ڕێکخستنی ئەو دانیشتنە بە.. کە ڕێکتخست سەرێکم لێ بدەرەوە.

شەنیا: بەڵێ باش.. کەواتە با زوو بچم ئەو ئیشە تەواوکەم.

ڕەمزی: چاوی ئیش دەرئەهات، با دواکەوێ چییە؟ خۆ نیگار لێرە نییە.. دوای ئەمەش تا ماوەیەک ئیشیتر وەرناگرین، وا زوو هەڵناسێتەوە.

شەنیا: توخوا بە ڕاست وەڵامم بەرەوە، تۆ پێت وتم ماوەیەک لەماڵەوە بێ بۆ ئێمە باشە.. توخوا دەستی تۆی تیا نییە ئەم پەکخستنەی؟

ڕەمزی: ئاوا باشترە یان نا بۆ ئیشەکەی ئێمە؟

شەنیا(( بە پێکەنینەوە ئەدا بەسەری خۆیا )): ئەهـ باوکەڕۆ، چۆن گەیشتیە ئەو بنی دنیایە.

ڕەمزی(( خەندە )): من نەموت من بووم.

شەنیا: کورە ئیشەکانت ئەناسمەوە لە ئەمەریکاش بێ.. تۆی بۆ چییە بڵێی من بووم یان نا؟

ڕەمزی: تۆ زۆرزانیت شەنیا.. منیش ئەزانم تۆ ئیشم ئەناسیتەوە.. ئەزانی خەریکە ببی بە نهێنگری گروپەکە؟

شەنیا: ئەی چۆن شوێنەکەیت دۆزییەوە؟ بەخوا من نەمئەزانی لە چ شارو هاوینە هەوارێکیشە؟

ڕەمزی: تۆش بتویستایە ئەتزانی.. تەلەفونم بۆ کرد وەک هەواڵپرسین و وتم لە کوێی؟ کەی دییتەوە؟ بیرت ئەکەین.. وتی لەمڕۆوە تا ئەم دوو شەوەیتر لە فلانە کابینەین لە فلان شوێن، دوای ئەوە ئەکەوینەوە ڕێ.. ئێ ئیتر خۆت ئەزانی بۆ پیاوی بەکار ئەوەندە بەسە.. فیتەرو خەڵکی خۆمانم ناردو لەسەیارەکەی زوبێرا ئیشی خۆی کردو زوبێر انا للە وانا الیە راجعون، نیگاریش ئیشەڵڵا چاک ئەبێتەوە هههه.

شەنیا: خۆت داتنابوو ئاوا بکەوێتەوە؟

ڕەمزی: نا.. ڕاستیەکەی باشتر بوو هەندێ شکاوی هەبووایە.. من چووزانم ئەوەندە بە خەستیی وەریئەگێڕێ، خوا بیگرێ.

شەنیا: ئەی زوبێر بۆ بمرێ؟

ڕەمزی: شەنیا تۆ هەموو داهاتووی ئەم گروپەیت، من وات پەروەردە ئەکەم.. ئەم نهێنییەش بزانە، تازە من و تۆ یەک کەسین.. ئەمەوێ ئەم بیرو باوەڕە لە مێشکی خۆتا بچەسپێنی.. کەس بۆی نییە چاو ببڕێتە ژنەکانی کاک دارەوان.. بەوە من کەللەیی ئەبم و هاوسەنگیی لە دەست ئەدەم.

شەنیا (( حەپەساو)): واو، ئەی سەرۆک؟

ڕەمزی: من وتم هیچ کەسێک بۆی نییە.. بە دەمیانەوە ئەچم، بەڵام چاوم لە تەوقی سەرما ئەخولێتەوە کە باس ئەکرێن.

شەنیا: ئەگەر ئەوی ئەوانیش سەربگرێ، سەرۆک ئەمرێ؟

ڕەمزی: کێشەی هیچ کەسێکمان نییە.. ئەوسا من سەرۆک و تۆ جێگرەکەمی تا بمێنم.

Cut

دیمەنی – ١١٣٤ – ڕ/ د – بەرچاپخانەکە:

(( خدر بەرەو ئۆفیسی وەکالەت ئەگەڕێتەوە، هەندرێن ڕا ئەکات و پێی ئەگا ))

هەندرێن: کاکە حمەخدر گیان زەحمەت نەبێ.

خدر(( ئاوڕ ئەداتەوە )): هەلەو کاک هەندرێن، باشی؟.. بیرمە بەخوا بەڵام نەمبینیوە.

هەندرێن: باوەڕ کە مێشکی کون کردووم، لە بەیانییەوە دە تەلەفون زیاتری کردووەو شەویش لە ماڵەوە، هەر مەپرسە چی کردووە بۆ ئیش؟ من زانیم لای خۆمان جێ نییە، کەچی ئەو ئەیوت جا با ئەوی کاک ئاوا بێ.. چی لێبکەم؟

خدر: خەمت نەبێ، هەر دەرنەکەوت خۆم ئەچم بۆ لای، بەخوا بیرمە.

هەندرێن: ماڵت ئاوا بێ یاخوا، عەزێتیشت ئەدەم.

خدر: لە خزمەتتام.

(( خدر ئەچێ بۆ ئۆفیس و هەندرێن ئەگەڕێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٢٣٥ – ڕ/ن –ماڵی هەندرێن:

(( تافان تێل ئەکا ))

تافان: ئەی چۆن؟ لە خزمەتتام.. حەز ئەکەی عەسر، یان سبەی بەیانییەکەی باشترە، تا بزانم ئەویش ئەمڕۆ چیم بۆ ئەکا؟.. لە بەیانییەوە مێشیکم داغان کردووە، دە تەلەفون زیاترم بۆ کردووە، هەر ئەڵێم بیرت نەچێ، بیرت نەچێ.

ڕێبوار(( دەنگ)): ئافەرین دەستخۆش، کاک ڕێشار بە خۆڕایی تۆی بۆ ئەو کارە هەڵنەبژاردووە، سوور ئەزانێ هەرچییەکت لێ داوا بکا، ئەیکەی.

تافان: ئەمری ڕێشار لەبان دیدەمە دایمە، زۆریشی بیر ئەکەم پێی بڵێی توخوا.. باشە دوای ئەوەی چوومە کۆمپانیاکەی ئاوا چی بکەم؟

ڕێبوار: تۆ با جارێ خۆمان دوو سێجار دانیشین، ئەوسا ئەزانی چی ئەکەی، هیچ پەلە مەکە.. ئەوەی ئێستا گرنگە لەسەر داوای هەندرێن تۆ بچیتە لای ئاوا، نەک لەسەر داوای خۆت.. ئەویتریشی کە بینیتم پێت ئەڵێم.

تافان: بەیانی؟

ڕێبوار: ئا بەیانی باشترە بەڵکو شتێکی بۆ کردبی.

تافان: بچینە پارک یان قاوەخانەو شتی وا.

ڕێبوار: نازانم ئەگەر ترسێکت هەیە خەڵک بتبینن، ئەچینە شوقەکەی خۆم، ئەگەر ترسیشت نییە، ئەوا لە دەرەوە.. زگورتیم.. کەسی لێ نییە بێخەمبە.

تافا: نا بۆ شوقەی زوگورتی خۆش نییە، ترسیشم هەیە لە دەرەوە، قەینا هەر لە سەیارەکەتا ئەبین.

ڕێبوار: ئێمە ئیش ئەکەین تافان خان، خوشک و براین، لە من مەترسە لە هیچ بارەیەکەوە، گرنگ سەرکەوتنی ئیشەکانمانە.

Cut

دیمەنی – ١٢٣٦ – ڕ – ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو ئاواو خدر))

ئاوا: ئەگەر خزم یان دۆستی نزیکی خۆت بێ باشترە، ئیشەکە زۆر هەستیارە، متمانەی باشی ئەوێ.

خدر: سەرچاو، یەکێ لە برازاکانمت بۆ ئەنێرم.

ئاوا: نابێ هیچ سەیارەیەکی بەسەرا تێپەڕێ بە بێ پشکنین.. ئەوە هەموو ئیشەکەیە.. مەبەستت ئەو کوڕانەی ئێرەیە؟

خدر: بەڵێ.

ئاوا: بۆ وەزعی خۆیان زۆر تەواوە؟ تا تۆش یەکیان کەمکەیتەوە؟

خدر: خەمت نەبێ، ئەمڕۆو سبەی سێ چوارێکی تریان ئەهێنم بۆ حەماڵییەکە.

ئاوا: باشە، من بە تۆی ئەسپێرم و ئیتر بیری لێ ناکەمەوە.

خدر: ئەی لەتیف ناگەڕێتەوە؟

ئاوا(( لەسەر ڕۆشتنە)): نا.. مانگانەکەی ئەدەمێ و با هەر لە ماڵەوە بێ، گوناحە کۆشێ خێزانی بەسەرا کەوتووە.

تریفە: ئاوا گیان؟

ئاوا: گیانی ئاوا ئەمرکە.

تریفە: تۆ دانیشە، ئیشێکیان پێ سپاردووم پێت بڵێم.

ئاوا: لەسەر ڕۆشتنم ترێ گیان ئەمرکە.

تریفە: ئەو کاک هەندرێنەی لای خۆمان ئەناسی؟

ئاوا: ئەی چۆن؟

تریفە: پیاوێکی زۆر دەستپاک و بێ کێشەیە.. داوایکرد جێیەک بۆ خێزانەکەی بکەیتەوە لای خۆت، ئەگەر ئەزانی ئاساییە!

خدر: هەهە دووجاریشی بە من وت.

ئاوا: نایناسم، ئێوە ڕاتان لێیەتی.. (( وەک سوعبەت)) مەبەستم ئەوەیە خۆ چاو بەدەرەوە نییە؟

تریفە: منیش هەر چەند جارێکم بینیوە، باوەڕ ناکەم.. خۆ مێردیشی لەمناوەیەو منالّی گەورەشی هەیە.. ئەوە بۆ پیاوان وان؟

ئاوا: پیاوان چییانە؟ ها کاک حەمەخدر؟ بۆ قسەیەک ناکەی؟

خدر: هەر دەم بە گلەییە لە پیاو.

تریفە: نەوەلا ئەوە ئەگەر پیاوێک دابمەزرێنن، لەڕێوە پرسیار ئەکەن، گورج و گۆڵە یا سست و خاوە؟ کەچی هەر کە بیانەوێ ژنێک دامەزرێ، ئیتر ئەیهێننەوە سەر پلێت.. چاوبەلە یان نا، هیچی بەدواوەیە یان نا، لەگەڵ مێردی چۆنەو چۆن نییە؟ هەر ئەم پرسیارانە، کە هیچی بۆ ئیشکردن پێویست نییە.

ئاوا: نا نا تریێ گیان ئەوە پرسیارە گرنگەکانەو دوای هەموو شتێک ئەڵێین خوا بکا گیانی خۆی خۆش نەوێ و تەممەڵ نەبێ.. تۆ نازانی بۆچی ئەوانەی وتت زۆر پێویستە؟.. کاک حەمەخدر خۆت تێیگەیەنە.. ئەچمەوە ئەوبەر، خواحافیز.

تریفە: پێی بڵێم چی؟

ئاوا: ئەمری تۆ ناگەڕێتەوە خوشک گیان.

(( بە گەرمی خواحافیزیی کردن و ڕۆشتنی ئاوا))

تریفە: ئەرێ حەمە خدر، خۆ تۆ برات نییە، ئەم هەموو برازایەت لە کوێ بوو؟

خدر: کاتی نییە، دوایی خۆت تێئەگەی بەساقەوبم.

Cut

دیمەنی – ١٢٣٧ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

بەهێز: لە گەراجە؟

ئاری: بەڵێ گەورەم.. شارەزاکان لەوێن هۆکاری وەرگەڕانەکەی دیاری بکەن.

بەهێز: دەستتان خۆش.. وەڵامم لێ بگێڕەوە.

ئاری: سەرچاو گەورەم.

(( تحیە کردنی ئاری و چوونە دەرەوەی))

Cut

دیمەنی – ١٢٣٨ – ڕ/ د – پارکێک:

(( شەنیاو سامالّ ))

شەنیا: هەی نەیخۆی تالّە! ئێمە فیێڵەکە لە ڕەمزی ئەکەین، خۆ لە منی ناکەی؟

سامالّ: ئاخر بە قوربان ئەی ئەگەر چاودێرییان کردی و شوێنی منیشیان بەهۆی تۆوە دۆزییەوە؟ چی بکەین؟ خۆت سەگ و گورگەکە ناناسیت؟

شەنیا: چوک.. ئەوان ئەوە نیین شوێن پێی من هەڵگرن.. دڵنیا بە هەنگاو بە هەنگاو ئەزانم چۆن دێن و ئەچن.

سامالّ: بە چی؟

شەنیا: بە لێوردبوونەوەو دیقەت و ئەقلّ و لۆژیکی خۆم.

سامالّ: ئەی ئەگەر من شوێنی خۆمت پێ نەڵێم؟

شەنیا: لەو بڕوایەیا نیم ئەوە بکەی.

سامالّ: بە چیا ئەزانی؟

شەنیا: بە لێوردبوونەوەو دیقەت و ئەقلّ و لۆژیکی خۆم.

سامالّ: ئەی قوربانی ئەقلّ و فۆژیک و شتەکانی تریشت بم.

شەنیا: ئەزانی سامالّ من هەست ئەکەم تۆ خۆت وادەرئەخەی ئەو زاراوانە نازانی، بەلاّم زاراوە وتنی میللیەکانت خۆنواندن بوو، نەک ئەوانەی بە حساب من فێرم ئەکردی؟ ئاخر تو شەرەف کەس هەیە بە لۆژیک بڵێ فۆژیک؟ یان ئەمە ڕابواردنە؟

سامالّ: ئەک قوربانی ئەقڵت، وەلاّ ئەمەیان ڕێک ڕابواردن بوو.. خۆمم لێ کردی بەوپەڕی ناحاڵیی.

شەنیا: بە گێلم مەزانە، یەک دوو جاریتریش ئەو هەستەم لادروست بووە.

سامالّ: ئێستا چارەسەرمان چییە؟

شەنیا: ئەچیتە هەر شوێنێک، بە من ئەڵێی لەوێم.. منیش هەفتەی یەکەم نایەم بە دەورتاو لە هەفتەی دووەمەوە بە شێوازێکیترەوە دەرئەکەوم.

samaڵ: ئا.. لەچکێکی باش و عەینەکی گەورەو باوڕوکەیەک بۆ تۆ هەموو شتێک ئەگۆڕێ.

شەنیا: وای لێ ئەکەم.

ساماڵ: ئەگەڕێیتەوە کارگە؟

شەنیا(( تەماشای سەعاتەکەی ئەکا))بەڵێ.. بەس زوو دەرئەچم.

(( بە پیاسە ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٢٣٩ – ڕ/ن –ماڵی خدر:

(( هەرمێ خەریکی ئیش و کارەو باوکی بە ژوورەکەیا دێت و ئەچێ.. بە دەنگێکی کزی سیخنەوە بانگ ئەکا ))

باوک: هەرمێ، کچم هەرمێ (( هەرمێ گوێ قلاغ ئەبێ و ئاوڕ ئەداتەوە بەلای باوکیا )) هەرمێ گیان گوێت لێمە؟

هەرمێ (( لە خۆشیا ئەقیژێنێ و ئەچێ باوەش ئەکا بە باوکیا )): باوکاااااا گیان!!! ئۆخەی ئەوە شوکر دەنگت کرایەوە باوە گیان؟

باوک: باشە؟ تێم ئەگەی ئەڵێم چی؟

هەرمێ: هەر زۆر زۆر باشە، زۆر بە باشیی تێت ئەگەم باوکە گیان.

باوک(( سەربەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان )): ئۆف خوایە هەزارجار شوکر بە بەشت.. زۆر سوپاس خوای گەورە.

هەرمێ: هەر ئێستا بە کاکە پۆلا ئەڵێم.

باوک(( خەندە )): پۆلا نا.. حەمەخدر!

(( هەرمێ مۆبایل هەڵئەگرێت و دیقەتی ناوەکان ئەدا ))

Cut

دیمەنی – ١٢٤٠ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر- ژووری نەخۆش:

(( ئامۆ و بروسک و ڕێژوان و خدر بەدیار زوبێرەوە وەستاون.. زوبێر ئۆکسجینی لە دەم و لوتایە))

ئامۆ: تۆ دانیشە ڕێژوان گیان ماندووی چاوەکەم.

ڕێژوان: لە خزمەتتانام.

خدر: دکتۆری مێشکەکە وتی چی؟

بروسک: ئەویش ئەڵێ مەگەر هەر ڕەحمی خوا، ئومێد زۆر لاوازە کاک حەمەخدر.

ڕێژوان: سەعاتێکیتر نەشتەرگەرییەکەی بۆ ئەکا، بەڵام خۆمان گۆڕو کفن و دفنەکەمان ئامادە کردووە (( بە کوڵ ئەگری)) بەخوا تەواو، تەواو ئیتر باوکم نایەتەوە ناومان.

خدر: ئەوەندە بێ ورە مەبە کاکە ڕێژوان.. چەند کەسیترمان بینیوە دکتۆر هەر ئیزنیشی داوەو ئێستاش لە من و تۆ بەدەماغترە.

ڕێژوان(( ئامازەی جەستەی باوکی ئەکا)): بەخوا ئەمە پەیوەندیی بە ورەوە نەماوە.. کوێی چاک ئەکرێتەوە؟

ئامۆ: هەر نەشتەرگەریی مێشکەکەی سەرکەوتوو بێ، ئەوانیتر خۆی وردەوردە چاک ئەبێ.. کێشەکە هەر مێشکیەتی.. (( بۆخدر)) وتت باوکت کەوتۆتەوە قسە؟

خدر: بەڵێ کاکە ئامۆ، ئێستا هەرمێلەی خوشکم تێلی بۆ کردم.

(( پێخۆشبوونی هەمووان))

ئامۆ: دکتۆرەکەی وتی ئەم نەشتەرگەریی ئیرۆپلاستە زۆر تازەیەو ڕێژەی سەرکەوتنی زۆر زۆرە.. بەڵام ئەبێ بیهێنیتەوە بۆ لای، گوێم لێبوو کە ئەبێ چارەسەری سروشتیی بۆ بکا.

خدر: بەڵێ ئێستا بچمەوە ئەیهێنم، پێمخۆش بوو سەرێکی کاک زوبێر بەم، بەو هیوایەی زوو بێتەوە هۆشی خۆی و هەمووی تێپەڕێنێ ———— Cut ————

دیمەنی – ١٢٤١ – ڕ/ د – بەردەم سوپەرمارکێت:

(( ڕەوەز تێل ئەکا، هەر کراس و کاوبۆ یان جلی کوردی لەبەرایە، لەگەڵ ڕێبوار بە چاکەت و پانتۆڵەوە، پێکەوە وەستاون))

ڕەوەز: دەی باشە ملتشکێ هەواڵی خۆش بووایە نەتئەدامێ. (( مۆبایل دائەخاتەوەو بۆ ڕێبوار)) ئێ!!! یەعنی تەواو ئامادەت کرد.

ڕێبوار: هەر ناوی ڕێشارم برد داماوە گەشایەوە، ئەی چۆن حازر نابێ؟

ڕەوەز: تۆش درێغی لێ مەکە، ئەڵێن ڕێشار چاکی ئەکرد بە دەمیەوە، زۆر سەغیی بووە لەگەڵیا.

ڕێبوار: سبەی لە شوقەکەی خۆم ئەیبینم.. ئەمرت بە چییە؟

ڕەوەز: ئەی ناچێ بۆ دەوامەکەی لای ئاوا؟ یان دوای دەوام ئەیبینی؟

ڕێبوار: نا کاکە ڕەوەز، پێشتر دێت بۆ لای من و دواتر ئەچێ بۆ ئەوێ، تا بزانێ ئەمرم بە چییە؟

ڕەوەز: ڕێبوار گیان پێی بڵێ دوو هەفتە هیچمان لێی ناوێ، تەنها خۆی شیرین بکات و متمانەی ئەو دووە بەدەست بێنێ.. نانی لە پڕو چاو قاوەیەو شەربەتەو ئیتر ئەو جۆرە شتانەیان بۆ بکاو بیانداتێ.. پارەشی بەرێ با زیادە مەسرەفییش بکا ئاساییە.. بڵێ دواتر خواردنێک لەگەڵ هی دەرەوە تێکەڵ بکاو ژەهر بکاتە خواردنەکەی نینای ژنیەوە.

# (( ئەڵقەی شەست))

ڕێبوار: ژەهرەکەی بدەمێ، یان جارێ؟

ڕەوەز: بە دڵی خۆت.. وەڵا پێی بێ باشترە، ڕەنگە لە پڕێکا ڕێک بکەوێ خواردنێکی دەرەوەی بداتێ.. بۆ نا؟.. ئیتر خۆت زۆر پیایا هەڵبەو وەسفی زیرەکیی و جوانییەکەی

بکە.. خۆی جوان نییە، بەڵام ئەڵێن زۆر دڵی خۆش ئەبێ پێی بوترێ جوان، بڵێ منداڵەکانت جێهێڵە بە قسەت ئەکا هههە ڕێشاری زۆڵ بەوەو بە پارە گرتبووی.

ڕێبوار: جا هەر ئەو دووە بێ هەر زۆر ئاسانە.. هههە.

Cut

دیمەنی – ١٢٤٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو نینا ))

نینا: زۆرم برسییە ئاوا گیان.

ئاوا: کچێ تۆ لەفەکەی منیشت خوارد، نەبووبی بە دووان بۆیە تێر ناخۆی؟

نینا: نا، ئەوە نییە.

ئاوا: دەی ئەو کاتە ئەبێ ئاگام لە خۆم بێ منیش نەخۆی هههە.

نینا: لە شیرینییەکەت ئەترسی؟

ئاوا: نا لە چەورییەکەم، خەریکە کەمێ گۆشت ئەگرم.

نینا: ئێستە تۆ پێم بڵێ، زوو ئەڕۆینەوە، یا ئەحە بنێرم لەفەیەکیترم بۆ بێنێ؟ هههە.

ئاوا: کچێ هەستە ماڵ و موڵک، ماڵەوە هیچی لێ نییە.. ئەتبەم بۆ باشترین خواردن.

نینا: ئۆیییییی چەند سوپاست ئەکەم..(( عەیارانە)) هەستە دەی!

(( هەڵئەسن ))

Cut

دیمەنی – ١٢٤٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا پەلەیەتی و ڕەمزی))

شەنیا: دەی کاکە!

ڕەمزی: دەی حەز ئەکەی تۆ بڕۆ، ئەڵێی ئاگری جگەر هەڵیگرتووی؟

شەنیا: دە ئاخر عەیبە زۆر دواکەوتووم.

ڕەمزی: تۆ بڕۆ منیش دوایی دێم.

(( شەنیا خواحافیزیی و ڕۆشتن))

**ڕەمزی مۆنۆلۆژی ناوەوە:**

چی بکەم؟ چۆن نەهێڵم ئەم خێروبەرەکەتەم لەدەست دەرنەچێ؟ خۆ ئەزانم شەنیا هەرچی پێ بکرێ ئەیکا بۆ ئەوەی نەڕوا.. بەڵام کابرا خۆی داماو نیشان ئەدا، ئەگینا موو نەرم نییە.. ئای! هیچ حساب بۆ ڕای شەنیاش ناکا.. بە دڵنیایی شتە.. ئا ئەو کابرایە شتە، ئەبێ ڕاو بکرێ و خۆشم ڕاوی بکەم.. ئەوە نییە لەدەستی من قوتاری ببێ هەهە.

**مۆنۆلۆژ تەواو:**

Cut

دیمەنی – ١٢٤٤ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە دەرگای داخستووەو تێل ئەکا ))

تریفە: با منیش بێم............. ئەی تۆ باوکت ئەبەی، پێویستیت بەهاوکارییە گیان............. بچمەوە بۆ ماڵەوە؟ ............. (( خەندە)) ئەی بە ناچاریی هههههه.. ......................... باشە شەوێ سەربەی ها!!........... ئەگەر نەیەی؟.............. خۆ دڵیشم نایە هیچ بڵێم و هیچیشم لە دەست نایەت............ بەقوربانت بم، زۆر سوپاس............... دەباشە با سەرقاڵت نەکەم، بچۆ بەلای باوکتەوە بەقوربان......... گیان........... چاوەکەمیت، کاتی خۆش بۆ تۆش.

(( ئەڕوات بۆ سەیارەکەی خۆی))

Cut

دیمەنی – ١٢٤٥ – ڕ- عەسر / ن – قاوەخانە:

(( ڕەمزی و شەنیاو سامالْ))

ڕەمزی: هەرچییەکت کردووە وا بکە هەر قسەیان لەگەڵ بکەیت و نەڕۆی.

سامالْ: لەوە ئەچێ ئیشێکی گرنگت بە من هەبێ کاک ڕەمزی؟! من بۆ مانگێک ئەچمەوەو ئیشەکانی ئەوێم ڕێک ئەخەم و ئەگەڕێمەوە، ئەگەر وایەو ئیشت پێمە زووتر دێمەوە.

ڕەمزی: خۆ لەبەر شەنیا هەر ئەبێ زوو بێیتەوە، بە نوکەنوک مێشکمان ئەبا.

شەنیا(( دەموچاوی داوە بەیەکا)): نەوەڵا کوا من نوکە نوکم کردووە؟ کەیفی خۆیەتی، کەی دێتەوە با بێتەوە، یالْلای ئەکرد سالْی پێ ئەچوو.

سامالْ(( خەندە بۆ شەنیا)): ئەوە لە پشتی منەوە حالْت وایەو خۆت دەرناخەی؟

شەنیا: نەوەڵا گالْتە ئەکا.

سامالْ: بەخوا بەوەی دەموچاوت داوە بەیەکاو ترشاو دیاری، ڕەنگە وابێ.. دە ئەگەر وایە قسە بکە.

شەنیا(( هەلْئەسێ بۆ توالێت)): نەخێر هیچ وا نییە. (( ئەڕوات))

(( ڕەمزی و سامالْ پی ئەکەنن))

ڕەمزی: دیارە خۆشی ئەوێی، هەستی پێ ئەکەی؟

سامالْ: هەر زۆریش.. منیش هەستم لەو کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێ.. با بکەوێتە دوای گەڕانەوەم، ڕاست ئەکەی بە نوکەنوک داغانتان ئەکا هههە.. با جارێ وا نەبێ.

ڕەمزی: تۆ لەوێ گروپی مافیات هەیە؟

سامالْ(( سلْەمینەوە)): کاک ڕەمزیییییی!!! ئەو پرسیارانە چۆن ئەکرێ؟

ڕەمزی: ڕاستە ببورە.

سامالْ: ئاساییە من بپرسم ئێوە شتی وا ئەکەن؟ بە دڵنیاییەوە نا.. هیچ کەس نهێنیی خۆی هەرزانفرۆش ناکا.

ڕەمزی: ڕاستە، بەو هیوایەی هەردوولامان پەردە لەسەر هەموو نهێنییەکانمان هەڵگرین ئەگەر هەبێ.. بەڵام بکەوێتە دوای گەڕانەوەت باشترە.

سامالْ: ئەگەر هەبێ بۆ نا؟ لە خزمەتدام.

(( شەنیا دێتەوە دەموچاوی شتووە))

ڕەمزی(( پێکەنین)): ئەوە خۆ کاک سامالْ ئەڵێ من ژن و منالْم هەیە لێی شاردووینەتەوە تا ئێستا.

شەنیا: پیرۆزی بێ خوا لە یەکیان نەکا.. (( گرژ بۆ سامالْ)) وایە سامالْ؟

(( ڕەمزی و سامالْ پێکەنینی زۆر))

ڕەمزی(( بە پێکەنینەوە هەڵئەسێ)): دەی کاکە من بەزمی خۆمم نایەوەو جێتان ئەهێڵم، خۆتان ڕێککەونەوە.

(( سامالْ و شەنیا لەبەری هەڵئەسن و خواحافیزیی))

شەنیا(( سەرسام)): ئەک باوکی خۆم ڕۆ نەبێ، کە تۆ نمایشکارێکی گەورەی! ئەوە چی بوو کوڕی عاسمانەکە؟

سامالْ: وەڵا وتیان تۆ دەستەپاچەی تیایاو هیچی لێ نازانی، وانا؟ ئەی ئەوە چی بوو تۆ کردت ئەو گریان و خۆ سەغڵەت کردنە هههههە. ئەک مالْم ئاوا کردی.. ئەرێ بە ڕاستت بوو یان هەر نمایش بوو ئەوی تۆش؟

شەنیا(( چاوبزانە)): ئەی ئەوی تۆ؟

Cut

دیمەنی – ١٢٤٦ – ش / ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( دەوران بە دیار دایکیەوە، نارەوەن و تریفەو تیرۆژ و نینا دێن بۆ لای.. پاش سڵاو و هەواڵپرسینی نیگار))

دەوران: نیوەڕۆ چاوی هەڵهێنا.

(( خۆشحاڵیی هەمووان))

تریفە: وەڵا حەمە خدر وتی، زۆرم پێخۆش بوو.. ئەلحەمیلا لەخوا بەزیاد بێ.

دەوران: قوربانت، لە خۆشیا بن.. دکتۆر ئەڵێ ئێستا خەوتووە.

نارەوەن: خۆ مێشکی سەلامەتە؟

دەوران: دکتۆر وا ئەڵێ ئەوچاتر.

نارەوەن: ئەک لەخوا بەزیادبێ.. ڕۆڵە هەرچیت پێویست بوو، ئەوە خۆمم ئەوە کچەکان، شەرم نەکەی ئێمە یەک خێزانین.

دەوران: شەرم چۆن لە دایک و خوشکی خۆم ئەکەم دایەگیان، تازە تۆ دایکمی و ئەوانیش خوشکم.

نارەوەن: ئاخر چووزانم؟ لە ڕووا دابمێنی یان شتێک.. من ئەچم سەرێکی کاک زوبێریش ئەدەم و لای ئامۆش دڵنیایی وەرگرم، ئەگەڕێمەوە.

(( هەستی دێتە ژوورەوەو پاش سڵاو و هەواڵپرسین و تعارف لەگەڵ خوشکەکان و براژن و دایکی تازەی))

هەستی: ئەی شوکور ئێستا باشترە؟

دەوران: ئەوەتا ئەیبینی، باشی چی؟

(( ڕۆشتنی نارەوەن))

Cut

دیمەنی – ١٢٤٧ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٢٤٥ – ش/ن – قاوەخانە:

((ساماڵ و شەنیا))

شەنیا: ئەی بۆ هەر بەڕاست نەچین؟ خۆ ڕەنگە دوایی سەیری پاسەپۆرتەکەت بکەنەوە، بزانن چوون و هاتنی تیایە؟ زۆر بە تاقیین، وریابە سامال.

سامال: ئەزانم گیان.. ئەویشم جۆر کردووە.. برادەرم هەیە ئەو مۆرانەم بۆ لێئەدا.. پاسپۆرتەکەو هەموو شتەکان ساختەیە، سەفەری چی؟ من هەر لێرەش ڕۆژانە بتبینم، دنیا هی منە، سەفەرم هەر ناوێ.

شەنیا: بۆ منیش هەروایە سامال گیان.. سوپاس.

سامال: باشە ناشرین کە هەستت هەبوو بۆ من، ئەبێ خەڵک ڕێکمان بخا؟

شەنیا: ئەوەیان لە خۆت بپرسە تێ نەئەگەیشتی.

سامال: ئەگەر لە دڵی من ئەپرسی، هەر یەکەم ڕۆژەکەی ئۆفیسی خوشکەکەی دەوران، هەموو شتێکم پێ ئەوتی.

شەنیا: ئەی بۆ نەتوت؟ منیش خۆم بۆ نەگیرا یەکسەر ژمارەم لێوەرگرتی.

سامال: چیم پێ بوتیایە مالۆایران؟ تۆ سەیری جوانیی خۆت کردووە؟ کێ ئەوێرێ بە ئاستەم چاو ببڕێتە چاوت.

شەنیا: ئەی ئەوە نییە ئەوێری؟ هههه.

سامال: ماڵی خەڵک ئاوا بێ دەرگای کردەوە.

شەنیا: ماڵی ئەو خەڵکەی باسی ئەکەی بەقوڕگیرێ باشە.. ئەوە شێرپەنجەی ناو کۆمەڵگەیە خەڵکی چی؟

سامال: شەنیا گیان خۆشەویستی نێوانمان بەسە بۆ ئەوەی زۆر ڕاشکاو بین لەگەڵ یەکتر.

شەنیا: وایە.

ساماڵ: بۆیە هەر داواکاریی و مەرجێکت هەیە لەسەر من، یان ئەتەوێ چۆن بم؟ لە ئێستەوە بیڵێ و منیش پێمخۆش بێ هەرچۆن بیت، ئێستا ئەیڵێم.

شەنیا: بەدڵمە، نەک نەتوانین بە دڵی یەک هەستین و دانیشین، باشترە ئێستا بوترێ.. داوای منیش زۆر کورت و پوختە.

ساماڵ: کە باشە، ئەوی منیش هەروایە.

شەنیا: یەکەم، ڕقی دنیام لە درۆیە ، نامەوێ درۆم لەگەڵا بکەی لە هیچ شتێکا.. دووەم، ئەبێ ئەم ڕێگەیە لەگەڵ ئەو کەرە بۆزەیا بەیەکەوە تێپەڕێنین و کۆتایی پێ بهێنین، بەوجۆرەی من مەبەستمە نەک تۆ.. سێیەمیش ئەوەیە، کە بەڵێنت پێدام بۆ هاوسەرگیریی زوو جێبەجێی بکەین.. حەزم لە دواخستن و دەستبڕین نییە.. من لە ئێستاوە تۆ بە هاوبەشی ژیانی خۆم دائەنێم.

ساماڵ: هەموویم قبوڵە گوڵی گیان.. من بە هەموو هێزمەوە داواکانت وەکو خۆی بەدی ئەهێنم.

شەنیا: دەی فەرموو قسەی تۆ؟!

ساماڵ: پێش هەر شتێک بۆ من گرنگە دەستت لە هیچ تاوانێکا نەبێ، بەوە گەر یەکیش بگرین هەڵئەوەشێتەوە.. دووەم، هەر شتێکمان لەسەر هەر تاوانێک زانی، پێویستە بە یەکتری بڵێین.. چونکە وەکو بۆم دەرئەکەوێ لە دوواییدا ڕووبەڕووی دادگاو سزاکان ئەبینەوە، با هەردووکمان بێ سەرێشە لێی بێینە دەرەوە، ئەویش بە ڕاوێژکردنی یەکتر.. سێیەمیش، هاوسەری دڵسۆزی یەک بین.

شەنیا: تێگەیشتم.. بەڵام من درۆت لەگەڵ ناکەم ساماڵ، هەندێ شت هەیە ئێستا ناوترێ.

ساماڵ: بۆ؟

شەنیا: دوممەڵێکی زۆر گەورەیەو نەگەییوە جارێ، لە کاتی گەیینیا، پێویستی بە تۆیە بیتەقێنی.

سامال: ئەگەر تۆ ڕووبەڕووی دادگاو سزا نەکاتەوە ئاساییە.

شەنیا: من نە تاوانبارم، نە هاوبەشیی تاوانیشم کردووە، خۆم زۆر پاراستووە.. بەڵام ئێستا کاتی ئەوەیە هەموو شتێکت لەسەر خۆم بۆ بگێڕمەوە.. بە تایبەت، کە باوکم تاوانبارەو لە زیندایەو سەبارەت بەو ئامۆیەش کە بۆم باسکردی.. هەمووی پێکەوە بەستراوەتەوە.

سامال: ئامۆش لەگەڵ باوکتا تاوانبار بوو؟

شەنیا: نا.. ئامۆ تاوانێکیتری هەیە، کە زیندان و سێدارە هیچ نییە بۆ ئەو.. من ڕقم لێیەتی، بەڵام هەموو ڕاستییەکانت پێ ئەڵێم.

Cut

دیمەنی – ١٢٤٨ – ش / د – سەرشەقام، یان پارک و قاوەخانە:

(( سەرچڵ و دڵنیا ))

دڵنیا: زۆر درەنگمان کرد سەرچڵ گیان.

سەرچڵ: باشە دڵەکەم ئێستا ئەڕۆین، نابێ تەلەفونەکەم بۆ بێت؟

دڵنیا: ئەی ئەگەر نەهات؟ بۆ من درەنگ ئەبێ و ڕقم لە لێپرسینەوەی برایە.

سەرچڵ: کەواتە ئەیخەینە سبەی شەو.

دڵنیا: ئەی بۆ عەسران دانەنیشین، ئیتر منیش لە بۆڵەبۆڵیان ڕزگارم ئەبێ، تا درەنگانێکیش ئەمێنینەوە.

سەرچڵ(( تێلی بۆ دێت)): ئەوە ئەوە. (( وەڵام ئەداتەوە)) بەڵێ چاوەڕوانم.......... (( ماوەیەک ئەوەستێ ئەویتر قسە ئەکا)) زۆر باشە تێگەیشتم.. بای.

دڵنیا: شتی ناخۆش نەبوو؟ نیگەرانی کردیت!

سەرچڵ: نا.. ناخۆش نەبوو، بەڵام ئیشێکی قورسە.

دڵنیا: هەروەکو ئیشەکەی کابرا نەبێ، ئاساییە، بزانم پێم ئەکرێ؟

سەرچڵ: لە بەیانییەوە چاودیریی شەنیای هاوڕێت بکەی.

دڵنیا(( تێک ئەچێ)): ئەوان چوزانن شەنیا هاوڕێمە؟ تۆ پێت نەوتبن؟

سەرچڵ: نا بەساقەوبم، ئەوان نازانن هاوڕێتە، بەڵام کە ناوی خۆی و باوکی وت، نەمهێشت درێژەی باتێ، وتم تێگەیشتم.

دڵنیا: جا شەنیای داماو چی هەیە تا چاودێریی بکرێ؟ هەیەو نییە حەزی لەو ئامۆ ناوەیەو ئەویش ڕەش بووە لەبەرچاوی.

سەرچڵ: هەستە با وردە وردە بڕۆین و تێتگەیەنم. ___________ Cut ___________

دیمەنی – ١٢٤٩ – ش/ن –ماڵی ئاکۆ:

(( گێلاس و ئاکۆ))

گێلاس: ئا ئەرەوەڵا هەر بێستون گەیشتە ئوتێلەکە، لە خۆشیا خەرک بوو سەمای ئەکرد.. هەر کە گەیشتیشینە ئەوێ، وتی دایکە خەریکە سوێم ئەبێتەوە بۆ سەرخەوێکی ژوورەکەی خۆم، ئەچم ئەخەوم، با بێستوون لەوێ بێ تۆزێ بینۆشێ هههه.

ئاکۆ: دیار زۆر گوێڕایەڵە، ئەم ماوەیە غەدری باشمان لێکرد، ڕاستییەکەی دەمێکیشە بۆ یەکێک ئەگەڕێم هاوکاری بێت، باش بوو بێستوون بێ ئیش بوو.

گێلاس: ئەی کە بیری کوڕەکەت هەیە، بیرێکی منیشت بێ پیاوەکە، بەخوا زۆر تەنیاباڵ و ماندووم.. ئەوە ئاواو نینایە خۆت ئەزانی کاری خۆیان مەیسەر بوو، ئیتر هەر پشتیان تێکردم.. باوەڕبکە هەر نازانم بە چ لایەکا ڕابگەم؟ تا سەوزەو وشکەی ڕۆژانە ئەگا، حسابی ڕۆژانە، تا ئەو ئەکەی موەلیدە، باج، میوانی بیانیی، سەرپەرشتیی وەستای خواردن، کرێکاری پاککردنەوەو شتن، کۆکردنەوەی لیستی میوان.. هەمووشی هەر خۆم، بەخوا دیاریش بێتاقەت ببوو.

ئاکۆ: ئەی نەتئەوت بمبینە چۆن وەک سەعات ئیش ئەکەم؟

گێلاس: ئێ بێویژدانیی تۆش تا ئەو ئاستە؟ دە بە ناو ئەو خزمانەتا بگەڕێ دوو سێ کوڕو کچی باشم بۆ بدۆزەرەوە هاوکارییم بکەن.

ئاکۆ: داهات هەر باشە؟

گێلاس: چی لە داهات بکەم، کە هەر لەگەڵ دەست ئەخەمە ژێر سەرم، خەوم لێکەوتبێ؟

ئاکۆ: ئەی چۆنە دەست بکەین بە ئوتێلەکەی ئەولاو لەو کرێیەش ڕزگارت بێ؟

گێلاس: وەڵا بابە جوانە.. من ئەڵێم پشتێن بە یەک لایی نەئەگەیشتەوە، ئەو ئەڵێ بۆ نایکەی بە دوولایی؟ ئاگات لە دەردەدڵەکەی من بوو؟ یان خەیاڵت لە شوێنیتر بوو؟

ئاکۆ: نەبەخوا شوێنیترم نییە، هەر لای تۆ بووم، بەڵام مەبەستم ئەوە بوو، ئەگەر دەست بکەین بەو، منیش لەگەڵتا ئەبم و دوکانەکە ئەدەینە دەست دیارەوە باشترە، بەخوا منیش حەوسەڵەی ئەوێم نەماوە، بۆ گەنج باشە.

گێلاس: دە وا بڵێ.. وەڵا پێمخۆشە.. تۆ جارێ سێ چوارێ بۆ من بدۆزەرەوە، یەکسەر دەست ئەکەین بەولا.

________________ Cut ________________

دیمەنی – ١٢٥٠ – ڕ/ن – ماڵی خدر:

(( خدر خۆی ڕێکئەخات بۆ دەرەوە بچێ.. هەرمێ دێت بۆ لای))

هەرمێ: ئەمڕۆش باوکم ئەبەینەوە بۆ دکتۆرەکە؟

خدر: بەڵێ، خۆم دێمەوە بە شوێنیا، ئەگەر نەشهاتمەوە تەلەفون بۆ غەمگین ئەکەم پێکەوە بیبەن.

هەرمێ: باشە، کەواتە بۆ نیوەڕۆ چێشت لێ ئەنێم، ئەبێ بێیتەوە.

خدر: بەساقەوبم هەرمێلە گیان.. ئەوەیان نا، ئەوەتا ڕەنگە نەتوانم بەدوای باوکما بێمەوە، چێشتی چی؟ باوەڕبکە هەر ئاگام لە کات نەماوە چۆن دێت و ئەڕوا.. بەساقەوبم عەفومکە.

هەرمێ(( دڵشکاو)): دەی باشە قەت خواردنی دەستی من ناخۆی!

خدر: دڵ و گیانی من، دە عاجز مەبە، بەڵێن بێ ڕۆژێک خۆم پێت ئەڵێم ناچمە دەرەوە تا چێشتەکە نەخۆم.

هەرمێ: دەی باش، ئەڕۆی؟

خدر: هەر زۆریشم پەلەیە، ئەرەوەڵا.

هەرمێ: خوا ئاگای لێت بێ.

(( هاتنە دەرەوەی خدرو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١٢٥١ – ڕ/د – دەرەوەی شوقەکانی ماڵی خدر:

(( تافان لە یەک دوو عیمارە ئەڕوانێت و دواتر ئەگاتە بەردەمی عیمارەی ماڵی خدر))

تافان: ئەمەیانە، تەواوە.

(( لە دەرگای عیمارەکەوە ئەچێتە ژوورەوە))

______ تابع ______ Cut ______

دیمەنی – ١٢٥٢ – متبوع – ڕ/ د – قادرمەی شوقەکانی ماڵی خدر:

(( خدر بە گورجیی بە قادرمەکانا دێتە خوارەوەو تافان خۆی زۆر بە جوانیی گۆڕیوەو ئەیەوێ سەرکەوێ.. چاوی بە خدر ئەکەوێ ئەترسێ و ڕەنگی ئەپەڕێ، خدر ئاگاتە ئاستی))

خدر: سڵاو تافان خان؟ ئەوە خێر لەمناوە ئەبینرێی؟!

تافان(( زۆر شڵەژاو)): سڵاو کاک حەمە خدر، تۆ چۆنی باشی؟ ئەی تۆ چی ئەکەی لەم شوقانە؟

خدر: من چاوەڕوانی تۆم ئەکرد، باش بوو دەرکەوتی!

تافان(( زیاتر تێک ئەچێ و خدر هەستی پێ ئەکا)): یەعنی.. یەعنی مـ مـ ن بۆ لای تـ تـ ۆ هاتووم؟

خدر(( لێی ورد ئەبێتەوە پێ ئەکەنێ)): نا نا تافان خان ببورە گاڵتەم لەگەڵ کردی، هەڵبەت بۆ لای یەکێک هاوڕێیەک خزمێکت هاتووی.. منیش لای هاوڕێیەکم بووم.. دەی بە یارمەتیت، فەرموو ئیسراحەتی خۆت وەرگرە.

تافان: ئەرەوەڵا بۆ لای ئەو ژنەی خزمم هاتووم، هەموو جارێ ئەو جلی تایبەتم بۆ ئەدورێ.

خدر: دەی فەرموو دادەگیان، ئەمرێکت نەبوو؟

تافان: وەڵا داوایەکم هەیە کاک حەمەخدر گیان.

خدر: فەرموو خوشکەکەم ئەمرکە!

تافان: ئەگەر زەحمەت نەبێ، با هەندرێن نەزانێ، زۆر ڕقی لەو ژنەی خزممە، هەر بزانێ هاتووم بۆ لای، بەخوا تەلاقم ئەیا.

خدر: نا تافان خان بێخەمبە، ئەوە چ پەیوەندیی بە منەوە هەیە تا باسیکەم؟.. بەڵام هەر بۆ زانیاریی خۆت، ڕەنگە بە هەڵە هاتبی بۆ ئەم شوقانە، چونکە ژنی تیا نییە تا بەرگدروبێ.. خواحافیز!

تافان ((زۆر تێک ئەچێ.. لەبەرخۆیەوە)): هەی قوزەڵقورت خوێڕی هیچ و پووچ، بەردی خۆی تێگرتم.

(( دوودڵیی لەسەرکەوتن بە قادرمەکانداو دواتر سەرئەکەوێ بۆ بەردەرگای ماڵی ڕێبوار))

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ١٢٥٣ – متبوع – ڕ/ن – ماڵی ڕێبوار:

(( ڕێبوار بە جلی ماڵەوە دەرگا لە تافان ئەکاتەوەو تافانیش وەڕس و گرژ بە خێرایی دێتە ژوورەوەو لەسەر کورسیی یان قەنەفەیەک دائەنیشێ))

ڕێبوار: بەخێر بێی ئەوە بۆ وا تووڕەی؟

تافان: قەت بەخێر نەیەم و بەملی شکاوم بێم، کاشکای سەیارەیەک لێی بدامایەو نەگەیشتمایەتە ئێرە.

ڕێبوار: بۆ بەساقە چی ڕوویدا.

تافان: حمەخدرە ئەناسی؟

ڕێبوار: ناوەڵا من دوو ڕۆژە هاتوومە ئێرە عیبادەل بەشەر ناناسم.

تافان: بەناخێری گیانم هەر سەرکەوتم و ئەوم بینی.

ڕێبوار: خدر کێیە جارێ پێم بڵێ، خۆ خزمی نزیکت نییە؟

تافان: هەموو دنیا ئەیناسێ و ڕەفیقی هەندرێنی مێردیشمەو ئەو ئاوایەش کە بە نیازین ئیشی لا بکەم.

ڕێبوار: وەڵا ئەوە خراپە.. تۆ بڵێی نەیگێڕێتەوە؟

تافان: داوام لێکرد باسی نەکا، ئیتر بڵێم چی خۆی و خوای خۆی.. تۆ سەیریکە، هیچ لە نێوانمانا ڕووی نەداوەو بۆ ئیشەکە هاتووم، کەچی هەر لە خوتوخۆڕایی ئێستا کابرا بە جۆرێکیتریش تێ ئەگا.

ڕێبوار: زۆر زۆر ناخۆش بوو، ببورە هەڵەی من نییە، ناگاتە ئێوارە ئەم شوقەیە چۆڵ ئەکەم و ئەچمە شوێنێکیتر.

تافان: ئەو دەستە بخەرە ژێر سەرت، جارێکیتر نابینی من بۆ ماڵ بێم، هەر دەرەوە باشترەو بەرچاوییە.

ڕێبوار: دەی تۆ پشوویەک بە بەقوربان، با تۆزێ ئاوت بۆ بێنم.

تافان: دەستت خۆش سوپاس.. بەخوا خوێن لە بەدەنما وشک بووە، چی بکەم بە هەندرێن بڵێ.

ڕێبوار: تۆزێ بیربکەرەوە، خۆ ماشەڵڵا تۆ بەو هەموو جوانیی و زیرەکییەی خۆتەوە، چۆن وا بیر ئەکەیتەوە؟ کێ کێشە بۆ خۆی دروست ئەکا، تا بچێ ئەوە بگێڕێتەوە، ئینجا شایەت و شایەتکاریی و شەڕو بەزم.

تافان(( هێمن و خەندە)): دەی چاوی دەرئەهات، چی ئەکا با بیکا.. ئەرێ ئەوە تۆش وا ئەڵێی؟ من کوا جوانم؟ هەموو کەسێ بە جوانم ئەزانێ.

ڕێبوار: تۆ هەم زۆر زۆر جوانیت و هەم زۆر زیرەکیشی.. با ئێستا باسی ئیشەکە بکەین.

تافان: فەرموو.

(( دایالۆگی بەردەوام))

Cut

دیمەنی – ١٢٥٤ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( سەفین و دڵشادو عەبدوڵا دانیشتوون چا ئەخۆنەوەو سوعبەت و پێکەنین، تەمەنیان لە ١٨ بۆ ٢٤ساڵ، جلی حەماڵییان لەبەرایە))

سەفین: هەر هاتمە ساحەوەو گۆڵی خۆمکرد.. کاکە بوو بە چەپڵەڕێزانێ هەر مەپرسە.. کەچی لەولاوە یاریزانێکی ئەوان هات دەستی بۆ بردم، منیش تا هێزم تیابوو سرەواندم بە دەمیا، وەڵا فلّق کرامە دەرەوە هاهاها(( پێکەنینی هەرسێکیان)). بۆیە بردیانەوە.

دڵشاد: ئاخر هەتیو تۆ بە قسەی کەس ناکەی، چەندم پێوتی با من و عەبەش بێین؟

(( کاروانی حەماڵ دێت و تورە))

کارە: ئەوە سەفینە گێژە دانیشتووی چییان بۆ ئەگێڕیتەوە؟ من گێژ بووم ئەوەنە بەدوای حەماڵێکا بگەڕێم، ناچاربووم یەکێکی ئەوانم برد.

هاوڕێ: بۆ بەناخێری گیانیان، ئەمانەش حەماڵن؟ هەی طرحێو!!!

کارە: وەڵاهی مامە خدرم بێتەوە دەمیان ئەخاتە ئەو چڵکاوەی بەردەستتەوە.

هاوڕێ: پێنج دەقە جێیانهێڵە بۆ من، تا ئیشی خۆیان پێ بڵێم و کاک حەمەخدریش لێیان تورە نەبێ. ئادەی، ناوتان چییە؟

سەفین: سەفین.

عەبە: عەبدوڵڵای خزمەتکارت.

هاوڕێ: دەی تۆ بڵێ عەبە.. ئەی تۆ؟

دڵشاد: کاک دڵشاد.

هاوڕێ: دەی تۆش دڵە.. باش گوێبگرن ها! من دووجار قسەیەک ناڵیمەوەو دەسەڵاتی شەق وەشاندنم لە ئێوەش پێدراوە، بڕۆن لە کاک حەمەخدر بپرسن دوایی.

Cut

دیمەنی – ١٢٥٥ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( ئاری دێت بۆ لای بەهێزو تحیە))

ئاری: گەورەم ئەوەش ڕاپۆرتی میکانیکییەکان. (( فایلێک دائەنێ))

بەهێز(( ئەیخوێنێتەوە)): ئۆوا ! ئەوە چییە؟

ئاری: بەڵێ گەورەم سەمونەی سەرەڕۆتەکەیان لێکراوەتەوە، شل نەبۆتەوە بڵێین خۆی شل بۆتەوە، هەرچەندە سەیارەی تازە بۆچی سەمونەی شل ئەبێتەوە؟

بەهێز: ئەزانی ئەڵێی هیچ کەسێ لەم وڵاتەیا نامرێ بە پیلان نەبێ؟ زۆر سەیرە، ئەبێ دوژمنیان کێ بێ؟ با بێنەوە هۆشی خۆیان، زۆر شت دەرئەکەوێ.

Cut

دیمەنی – ١٢٥٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( خدرو ئاواو نینا ))

ئاوا: زۆر سوپاس کاک حمەخدر گیان، خوا لە برایەتیت کەم نەکا.

خدر: هیچم نەکردووە کاکە ئاوا گیان، بەڵام ئەوەندە هەیە بە هیچ جۆرێک متمانەت پێی نەبێت و با تێکەڵاویی نیناش نەکا.

ئاوا: تەواو؟ ئەوە قسەیە، هەر زۆر باش بوو پێتوتم، پێی ئەزانم قوربانت.

نینا: ماڵت ئاوا بێ یاخوا.. خەمی منت نەبێ تێکەڵیی کەس ناکەم.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی خدر))

تابع ______ Cut ______

دیمەنی – ١٢٥٧ – متبوع – ڕ/ د – بەردەرگای کۆمپانیای ئاوا:

(( خدر دێتە دەرەوەو تافان بەرەو ژوورەوە ئەچێ))

خدر: ئەرز خڕە زوو زوو پێک ئەگەینەوە.

تافان: کاک حەمەخدر گیان دەخیلت بم، خۆم فڕێداوەتە بەر پێی تۆ.. ئامان نهێنیم بپارێزە.. خوا کوێرمکا ئەگەر بەو شێوەیە بێ تۆ تێبگەیشتووی.

خدر: من بە هیچ جۆرێک تێی نەگەیشتووم دادە گیان، هەر بە چاوی ڕێزەوە تەماشات ئەکەم، ئەوە ژیانی خۆتەو خۆت لێی بەرپرسیت.. خەمت نەبێ، وتم پەیوەندیی بە منەوە نییەو هەر بیریشم ئەچێتەوە گەر خۆت بیرم نەخەیتەوە.

تافان: دڵنیابم وەک برایەکم ئەوەم بۆ ئەکەی؟

خدر: وتم پەیوەندیی بە منەوە نییە دادە گیان. (( ئەڕوات))

تافان: ئەک خوا بمکا بە قوربانت چەند پیاوی!! (( خدر دوورکەوتۆتەوە)) کوڕی سەگ! ئاخر دەبڵێ تۆ لە کوێوە بۆ من نازڵ بووی؟

(( ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٥٨ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( دیدەوان و نارەوەن))

دیدەوان: هەموو شتێک باش ئەڕوا، تۆ نەبی!

نارەوەن: کاتم زۆر بەدەستەوە ماوەو یەک پیتی تیا نەڵێی، ئەگینا.........

دیدەوان(( قسەی پێ ئەبڕێ)): ئەوە تێک بدەی چاک بزانە منیش شەریکیت ناکەم لە ئیشە گەورەکانا ها! با بزانی!

نارەوەن(( خەندەو دەموچاوگرژ کردن)): ئای خوایە لەدەست تۆ؟! ئەوە پەیوەندیی چییە بە ئیشوکارەوە؟

دیدەوان: دڵنیایی زیاترە.. گوێ بگرە.. ڕەنگە ئیشەکەمان زۆر ئاسان بکەوێتەوە؟!

نارەوەن: چۆن ناشێ خەڵکیان لێ ڕاسپێری؟

دیدەوان: نا باسی ئیشە گەورەکان ئەکەم، هاوسەرگیرییەکە نا؟!

نارەوەن: چوزانم.. وشک بووم.

دیدەوان: لە وڵاتێکی دەرەکییەوە گروپێک دێن و لەگەڵ خدرا تێکەڵیان ئەکەین، ئەبێ خدریش کەسی باش بدۆزێتەوەو پاسەوانیی خۆی بکەن، لەوەئەچێ ئەو گروپە زۆر چاوکراوەو دڕندەبن.

نارەوەن(( بە بەزەییەوە)): وەیش توخوا! یەعنی حەمەخدر تیاچوو؟ بەخوا ناهێڵم ئەوە بکا.

دیدەوان: نا هەناسەکەم، با خەڵکی زۆر لەگەڵ خۆی بێنێ و ئەوسا گروپێکی ئەوەندە گەورە دروست ئەکەین، دەست بەسەر تەواوی ئەو بازرگانییەدا بگرێ.. ئیتر من و تۆش بۆ خۆمان ئەچینە ئەو ئەوروپاو مەوروپایەو هەر سەرناکەینەوە بەمناوەیا تاتوشی عەزێت بین.

نارەوەن: نا بەخوا چۆن دڵم دێ لە منداڵەکان دوورکەومەوە؟ بەخوا شێت ئەبم.. قەینا تۆ بچۆ ئەوێ بەڕێوەبەرەو منیش ئێرە.

دیدەوان: ژن و مێردایەتی وا نابێ هەریەکەی لە وڵاتێک.

نارەوەن: ئێ باشە ڕێک ئەکەوین لەسەر ئەوە.. بۆم تەواوکە.

(( ڕەمزی دێتە ژوورەوە نارەوەن لەبەری هەڵئەسێ و سڵاو و وەڵام))

ڕەمزی: ئەوە چییە وا سەرتان کردووە بە یەکاو ئاگاتان لە دنیا بڕاوە؟

نارەوەن: هەر ئیشی کۆمپانیا نییە؟ ئەی ئەبێ ئێمەی داماو باسی چی بکەین؟

ڕەمزی: بە خۆشیی بێ.. چووم سەرێکی ئەو ژنە داماوەمدا نیگارخان.. بەخوا وەزعی زۆر شڕە، زەحمەتە ڕوح دەربەرێ.

نارەوەن: توخوا وا مەڵێ کاک ڕەمزی، هەر لەبەر ئەو کچە داماوەی، خەریکە شێت و هار ئەبێ.

ڕەمزی: هیچ نییە هەر ماوەیەکەو کە شوویکردو وتی بە گۆڕی دایکم، یەعنی بیری چۆتەوە.

دیدەوان: هەروەک چۆن ئێمەش بیرمان چوونەوە.

نارەوەن: دڵڕەقییش بەهرەیە، خوا نایدا بە هەموو کەس!

دیدەوان: ئیشی ئێمەش لەگەڵ دڵنەرما نییە نارەوەن خان.. ئەگەر دڵیشی پڕ بێ لە سۆزو بەزەیی.. ئەبێ لە کاتی ئیشەکەی لەگەڵ ئێمەیا، تووڕی هەڵدا بۆ جێگایەکی زۆر زۆر دوور.

نارەوەن: خۆ ئێستا کاتی ئیش نییە؟

ڕەمزی: قسەکەی جوانە، یەعنی ئەبێ خۆت ڕابێنی.

Cut

دیمەنی – ١٢٥٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو نیناو تافان))

ئاوا: ئەوە ڕاستیەکەیە، من بە کاک هەندرێن و تریفەشم وتووە، کەسمان پێویست نییەو میلاکی خۆمان بە زیادەوە هەیە.

تافان: پرسگەش خراپ نییە، زۆر سوپاستان ئەکەم.

نینا: بەڵام خۆت ئەزانی، هەموو ئیشێک بەرپرسیارێتییە تافان خان.. کە لەوێ دانیشتی، ئیشەکان با بە ڕێکوپێکیی بکرێن.

تافان: من و تۆ نینا خان، وەکو دوو خوشک ئەبین لێرەو هەرچی بوو، دێم بە خۆت ئەڵێم.

ئاوا: نا قوربان.. لە ڕێگەی تەلەفونەکەی بەردەستتەوە هەر شتێکت پێویست بوو بە من بڵێ، واز لە نینا بێنە زۆر سەرقاڵە با هەڵەش نەکات.. لەو شوێنەی خۆت بۆ هیچ شتێک هەڵمەسە، تا دەوامەمان تەواو ئەبێ.

تافان: ئەی جوڵەیەکە؟، دەموچاو شتنێکە؟!

نینا: لە تەنیشتی خۆتەوە هەموو شتێکی لێیە.

تافان: ئەی ئەگەر جاروبار خواردنێکتان بۆ بانگکەم، یا خۆم لێی بنێم لێرە؟ زۆر خۆشە ئەو شتانە.

ئاوا: هیچ شتێک تۆ ناهێنێ بەم دیوی پرسگەیا، وابزانم بە ڕوونیی باسمان کرد.. تەنانەت موچەکەشت بۆ دێتە سەر مێزەکەت.. فەرموو بۆ سەر ئیشەکەت، ئێمەش کارمان هەیە خانم.

تافان(( بە دڵی نییە)): بەڵێ باشە.

(( ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٦٠ – ڕ / ن –دوکانی شیرینیی:

(( ڕەوەزو ئەردەڵان))

ئەردەڵان: لەو ڕۆژەوەی کە لێتدام.

ڕەوەز: هیچ نییە، من وام لێنەدای عەزێتت پێ بگا.. ئادەی ڕێک کوێیە؟ با بیبینم!

ئەردەڵان (( سەری دائەخات و دەست بۆ شوێنێکی پشتی سەری ئەبات)): ئا ئەوەیە، ئا وەتا.. ئارامی لەبەر بڕیوم، زۆر یەشێت کاکە ڕەوەز.. ئەڵێم با بچم نیشانی دکتۆرێکی بەم.

ڕەوەز: ناچی.. برادەرێکم هەیە دکتۆرە خۆم لێی ئەپرسم و تەواو، دوو دەنک حەبی سەرێشەت بۆ ئەنوسێ، عەیبت نامێنێ.

ئەردەڵان: دە باشە، بەس توخوا تۆزێک خێرا کاکە ڕەوەز، وا هەست ئەکەم ئەو سەرمایەی لە گیانیشمایە هەر بەهۆی ئەو سەرێشە نەعلەتیەوەیە.

ڕەوەز(( گاڵتە پێکردن بە تووڕەییەوە)): دەی بزانە هەرچی عەیب و عاری مناڵیشت هەیە بەسەر لێدانەکەیا ساغیکەرەوە. مردووت مرێ ئەڵێی جوجکی دەواجنی بەرگەی هیچ ناگری!

ئەردەڵان: بەخوا زۆر بەرگە ئەگرم کاکەڕەوەز، بەڵام تۆ ڕەحمت پێ نەکردم.

ڕەوەز: باشە دەمت داخە.. ئێستا ئەگەڕێمەوە زۆرم پێ ناچێ خۆت مردار نەکەیتەوە ئاگات لە دوکان بێ.

ئەردەڵان: بەڵێ باشە.

(( ڕەوەز ئەڕوات و ئەردەڵان بە دەست بردن بۆ پشتە سەری خەریکە))

Cut

دیمەنی – ١٢٦١ – ڕ / ن - نەخۆشخانەی زوبێر - ژووری ئامۆ:

(( ڕێژوان و بروسک لای ئامۆ دانیشتوون ))

ئامۆ: بەڵێ دڕکە پەتکیشی زەبری بەرکەوتووە.. بەڵام نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو بوو، ئەوە زۆر دڵخۆشکەر بوو.

ڕێژوان: ئەژی؟

ئامۆ: بە قسەی پزیشکەکان بێ بەڵێ.. بەڵام تۆ چاوەڕوانی ئەوە بکەیت وەک جارانی لێ بێتەوە، کەمێک زەحمەتە، ڕەنگە بەشێک لە جەستەی لەدەست بدات.

بروسک: ئیفلیج ئەبێ؟

ئامۆ: وەک ئەڵێن تەواوی جەستەی نا.. ئیتر با هۆشی بێتەوە زیاتریش ڕوون ئەبێتەوە.

ڕێژوان: ئەی شکاویەکانی؟

ئامۆ: دکتۆر مێشکی بەلاوە گرنگتر بوو، ئەوانیتر لەبەرئەوەی لەبەرڕۆشتنی تیا نەبوو، خرابووە دوای نەشتەرگەرییەکەی مێشکی.. ئەمڕۆ سبەی ئەویش چارەسەر ئەکرێ.

بروسک: خۆ نیگار خان ئیفلیج نابێ؟

ئامۆ: نا ئەو بڕبڕەی ملیشی شکا بوو، بەڵام دڕکەپەتکی سەلامەت بوو.. ئەو ڕاست ئەبێتەوە.. بەڵام بەخوا کە شکست بووی چاکبوونەوەی تەواو زۆر زەحمەتە.. کاکە هەردووکیشیان تەمەنیان هەیە، ئەوەش کێشەیەکی گەورەیە.

بروسک: خوا ڕەحمکا، دەسەڵات نییە.

Cut

دیمەنی – ١٢٦٢ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕەوەزو ڕێبوار))

ڕەوەز: بەو ژنە بڵێ لەناو کۆمپانیاکەوە بە هیچ جۆرێک تەلەفونت بۆ نەکات، هەر شتێکی هەبوو دوای دەوام با بتبینێ، یان بۆت بکات.

ڕێبوار: بەڵێ باشە.. ئەی کەی بگوێزمەوە؟

ڕەوەز: نا.. دنیا هەر ئەمڕۆ نییە، نەک ئیشمان بە شوێنی ئەو خدرە ببێ، هەر لەوێ بەو جاروباریش چاودێرییەکی بکەیت و بزانی کێ هامشۆی ئەکا خراپ نییە.

ڕێبوار: ئەو ژنە ناوێرێ لە دەرەوە بمبینێ.

ڕەوەز: پێی بڵێ دەسەڵات نییە، ئیتر ئیشەکە وا پێویست ئەکا، یان دێیت بۆ ئەوێ، یان لە دەرەوە ئەتبینم.. کێشە نییە جاروباریش گەر تەلەفونی تێ بکەوێ.. بەڵام هەر خراپیشە. نەیکەن باشترە.. شتێکیشم بۆ بکە.. ئەو ئەحەیەی ئێستا لە کۆمپانیاکە پشکنین ئەکا، ئەویش وەک لەتیف ببەو هەڕەشەی لێ بکە.. با هەر وەکو لەتیفەکە سەرچاوەی هەڕەشەکە نەناسێ.

# (( ئەڵقەی شەست و یەک))

ڕێبوار: بەو دوو کوڕەی لای خۆم ئەڵێم، بەسەرچاو.

ڕەوەز: ئەگەر ئیشێکت نییە دابەزی باشترە.. با ئەوەندە پێکەوە نەبین.

(( دابەزین و خواحافیزیی و ڕۆشتنی ڕەوەز))

Cut

دیمەنی – ١٢٦٣ – ش/ن –ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژو تریفەو ئاواو تریفەو نارەوەن))

ئاوا: ئا ئا کاک حەمەخدر پێیوتم.

تریفە: ئەبێ چی لێ بینیبێ؟

ئاوا: بە منیشی نەوت، هەر ئەوەندە وتی وریای بن و زۆر متمانەتان پێی نەبێ.. منیش فرێمدایە پرسگەوە.. ئەی چی لێ بکەم؟ تازە گفتمان پێدابوو.

نارەوەن: وەڵا نەک بەو، متمانە بە هیچ کەسێکیتر مەکەن، لە خۆتان زیاتر.. ئەزانی دنیا چی لێهاتووە کوڕم؟ داماو داماو خۆیت پێ نیشان ئەدات و دواتر خواخوای دەرفەتێکیەتی پێتەوە با.

نینا: ئەم ڕۆژگارە دڵپاکیی باجی هەیە دایە گیان.

ئاوا: دەی ئێمە ئەچین سەرێکی نەخۆشەکان ئەدەین و لەوێوە ئەڕۆین.

تیرۆژ: بوەستە ئاوا با منیش خۆم حازرکەم.

نارەوەن: با ئەمشەو تریفە بچێ تیرۆژ گیان، تۆ زۆر ماندووی.

تیرۆژ: نەوەڵا هەر خۆم ئەچم، دڵم وەختە بتەقێ لە ماڵەوە.

نارەوەن: دەی بە کەیفی خۆت.. (( تیرۆژ ئەچێتە ژوورەوەو نارەوەن بۆ ئاوا)) ئاوا پارەیەکیش کەڵەکە بووە ئاگادار بە.

ئاوا: تازە ئەمشەو درەنگە.. سبەی شەو هەڵیئەگرم.

نارەوەن: باشە بیرت نەچێ.

ئاوا(( هەڵئەسێتە سەرپێ)): خەمت نەبێ (( دەنگی بەرز)) تیرۆژ دەستوبردکە.

Cut

دیمەنی – ١٢٦٤ – ش / ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و سەرچڵ))

ڕەمزی: شەنیا هەموو پارەکانی باوکی وەرگرتەوە.. تا ئەو کوڕە دێتەوە، کارگەکەی تۆی پێ ئەفرۆشین و بیکە بە ناوی ئەوەوە، ئیشمان بەو شوێنە هەیە، گومانی لەسەر نییە.

سەرچڵ: بە چەند بیدەینێ؟

ڕەمزی: هەرچەند خۆی پێی خۆش بێ.

سەرچڵ: من ئەبێ کەمێ نییەت پاکیی بۆ دڵنیا دەربخەم، بۆیە پێی بڵێم بە چەند ئەیدەمێ باشترە، زیاتر مەبەستم دڵنیایە.

ڕەمزی: بە دڵی خۆت، هەرچەندت پێ باش بوو بڵێ ئەوەندە.. ئەگەر شەنیاش ئەوەی پێ نەدرا، خۆم بۆت جۆر ئەکەم.

سەرچڵ: ئەو لە سبەینێوە چاودێرییەکە دەست پێ ئەکا.

ڕەمزی: دەستی خۆش بێ، شتێکیشی بدەرێ.

سەرچڵ: ئەی چۆن؟

ڕەمزی: من ئەمەوێ خۆت شتێکیترم بۆ بکەی.

سەرچڵ: ئەمرکە.

ڕەمزی: هەفتەیەک سەرۆکم بۆ بشارەوە، بێ ئەوەی بزانێ کێ فڕاندوێتی.

سەرچڵ: هاهاها سەرۆۆۆۆک!!! (( پێکەنین))

ڕەمزی: ئا.. بۆچی پێئەکەنی؟ پێت سەیرە؟

سەرچڵ: ئەی سەیر نییە پیاو سەرۆکەکەی خۆی بفرێنێ؟

ڕەمزی: نا بێ ئەقڵ هیچ سەیر نییە.. من پەروەردەی دەستی کاک دارەوانم، تۆش هی من.. هەر شتێک زانیت ئەبێ بە بەربەست یان بەرنامەت لێ تێک ئەدا.. لەسەر ڕێگەت دووری خەرەوە.

سەرچڵ: ئێستا بەربەستە یان بەرنامە تێکدەر؟

ڕەمزی: هیچیان.

سەرچڵ: کەواتە ئێستا بە ڕاست سەیرە.

ڕەمزی: گوێ بگرە، ئەمە ڕێک ئەوە بوو کە کاک دارەوان لەگەڵ ئەو خدرە گوێ ڕەپەیا کردی.

سەرچڵ(( لەسەر کورسییەک بە پێچەوانەوە دائەنیشێ)): ئادەی چیکرد؟ با ئەوەش بزانم.

(( ڕەمزی بیرکردنەوە))

<u>بۆ فلاشباک</u>:

ـــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٢٦٥ – **فلاشباک** – ڕ/ د – مانگی دوو – باخی ماڵی دارەوان:

(( دارەوان و نارەوەن))

نارەوەن: ئەمرکە باش قازی! ئەڵێی چی؟

دارەوان: ئەوە ئەو باخەت بۆ خزمەتێ ناکەی؟ ئاخر توخوا باخی ماڵ وا ئەبێ؟

نارەوەن: جا من چی لێ بکەم خۆ خۆم قوڕەکاریی ناکەم و پاکیکەمەوە.. من چی لە دار هەڵپاچین ئەزانم؟

دارەوان: ئێ تۆ وتوتە یەکێکم بۆ بنێرە دەستێ بەو باخەیا بێنێ و من نەمناردبێ.

نارەوەن: دوو ڕۆژە پێت ئەڵێم حەماڵێکم بۆ بنێرە ئەو شتانەم بۆ بگوێزێتەوە، بۆ سەرەوەو هی سەرەوە بێنێتە خوارەوە، خۆتی لێ بێدەنگ ئەکەی، ئینجا بڵێم باخەوانم بۆ بنێرە.

دارەوان: بەسەرچاو.. من ئەمڕۆو تا سێ ڕۆژیتریش حەماڵێکی گورج و گۆڵ و زۆر شارەزات بۆ ئەنێرم، هەرچی ئیشت هەیە بۆت بکات.

نارەوەن: ئەو تەممەڵەکەی جاری پێشوو نەبێ ئاخر!

دارەوان: نا نا ئەمەیان دانی مارە.

نارەوەن: یاخوا وا بێ.

دارەوان: خۆم ئیشم زۆر پێیەتی، لە سێ ڕۆژ زیاتر ئیزنی نادەم با بزانی، دوایی نەڵێی!

نارەوەن: تۆ سێ ڕۆژ بۆم بنێرە، ئیتر ئیشم نامێنێ، باشە.

**فلاشباک تەواو:**

Cut

دیمەنی – ١٢٦٦ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٢٦٤ – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و سەرچڵ))

ڕەمزی: ئەو ڕۆژە یەکەمین بار، کە تلیاکێکی زۆری تیابوو، گەیشتبووە ناو شار بە هۆی هەندرێنەوە.. هەندرێنی بە فوویەک دوورخستەوە.. بەڵام خدری بەدڵ بوو، ئەیویست بیهێنێتە گروپەکەوە، حەزی نەکرد لە یەکەمین بارەوە ئاگاداری هەموو شتێک بێت، بۆیە بەهۆی ژنەکەیەوە دووری خستەوە.. دواتریش هەر متمانەی زۆری لادروست نەبوو، هەر نەیهێنا.

سەرچڵ: بیهێنایە ئێستا ئەو لە سەرۆکیش گەورەتر ئەبوو، زۆر ساختەچییە.

ڕەمزی: حەددی نەبێ، بەڵام ئەوەیە ئێستا متمانەی من لەو هەموو حەزەی کاک دارەوانەوە دێت، کە ئەیویست خدر بێنێ.. جا ئێستا سەرۆک ئەڵێ بزانێ نارەوەنی لێ زەوت ئەکەم، زیانمان پێ ئەگەیەنێت.. منیش ئەزانم کە لەگەڵ نارەوەنا هیچ شتێکی نییەو تەنها نارەوەن ئەو بەکارئەهێنێ.

سەرچڵ: دوورخستنەوەی بەسە؟

ڕەمزی: ئا.. با بزانین بە هەفتەیەک چیمان بۆ ئەکرێ؟

سەرچڵ: ئەی ئەگەر هیچ نەکرا؟

ڕەمزی: هەفتە هەفتە ماوەی بێ سەروو شوێنییەکەی درێژ ئەکەینەوە.. ئەوەش هەر پلانێکی کاک دارەوان بوو، کە خۆشەویستی کچەکەی زوبێری بۆ فڕاند.

سەرچڵ: ئەویان چۆن بوو؟

ڕەمزی: من بۆ ئەوە سەرۆک ئەفرێنم باری دەروونیی نارەوەن تێک بدەم.. وای لێدێت دەستەمۆی من ئەبێت و ئیتر ئەو بایەخەی بە سەرۆک نەمێنێ.. ئەبێ نارەوەن بزانێ، من هەموو شتێ هەڵئەسوڕێنم نەک دیدەوان.

سەرچڵ:وەک ئەڵێی کاک دارەوان قەت لە سەرۆک ڕازیی نەبووە. ______ Cut ______

دیمەنی – ١٢٦٧ – ش / ن - ماڵی چیمەن:

(( بروسک و چیمەن))

چیمەن(( زۆر بێتاقەت)): توخوا بە ڕاستتە بروسک گیان؟

بروسک: بەسەری تۆ بە ڕاستمە، لە مەترسیی تیاچوون ڕزگاری بووەو ماوەتەوە سەر ئەوەی هۆشی بێتەوەو بیهێنینەوە بۆ ماڵەوە.. دکتۆرەکە وتی هەر زۆر باشە.

چیمەن: ئۆهـ خوای گەورە لە ڕەحمەتی تۆ بەزیاد بێ.. ئەزانی بروسک شتێکی لێ بهاتایە، خۆ من مردبووم.. لەخوا بەزیادبێ بەوەش بگەڕێتەوە، هەر باشە دەسەڵات نییە، قەزاوقەدەرە.

Cut

دیمەنی – ١٢٦٨ – ڕ / د – بەر ماڵی شەنیا:

(( شەنیا سەیارەکەی ئەهێنێتە دەرەوەو دڵنیا لە سەیارەیەکیترا سایەقی هەیە، لە دوورەوە چاودێریی ئەکا.. مۆبایل هەڵئەگرێت و تێل ئەکا ))

دڵنیا: لە ماڵەوە دەرچوو.. (( دائەخاتەوە)) دوایکەوە.. پەلە مەکە با هەستی پێ نەکا.

(( وردە وردە بەدوای سەیارەکەی شەنیاوە ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٢٦٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی گێلاس:

(( ئاکۆو گێلاس و دیار))

ئاکۆ(( بۆدیار)): خۆت ئیشت تیاکردووە، ئەمڕۆ ئەتبەم تا عەسر چاوم لێت ئەبێ و ئیتر (( بۆ گێلاس)) ئەچم بەلای ئەندازیارەوە، بۆ نەخشەکە.

دیار: هەر زۆریشم پێ خۆشە، بەس لەم ئوتێلە ڕزگارم بێ.

گێلاس: ئاوا؟؟؟؟ ئوتێلەکەی دایکت؟

دیار: بەخوا هی باوکیشم بێ بێزارم خۆ بەدەست خۆم نییە!

ئاکۆ: هەر لە دوکانیش پاش ماوەیەک وا نەڵێی باشە؟

دیار: نا باوکە، ئەوەیان تێکەڵی خەڵک ئەبی، زۆر خۆشترە.. خۆ من تازە خوێندنم هەر فت، بەخوا هیچ کاتێک ناچمەوە سەری.. جا با ئیشێک بکەم بە دڵی خۆم بێ، توخوا وا نییە؟

ئاکۆ: باشترە زۆریش.

گێلاس: لەبەر نینا توخوا سەرێکی ئەو قاچ و قول شکاوانەش بە گوناحە!

ئاکۆ: کێ گوناحە؟ نینا یان ئەوان؟

گێلاس: کورە نینا ئەڵێم نینا، با قسەیەکی نەیەتە سەر.

ئاکۆ: جا ئاوا پێیان ئەڵێی قاچ و قول شکاو؟

گێلاس: کورە دە ئەی بڵێم چی بڵێم پیرەمێردو پیرێژنیش هەر باش نییە.. گرنگ ئەوەیە بچیت و قسە ببڕی ئاکۆ گیان.

______________ Cut ______________

دیمەنی – ١٢٧٠ – ڕ / د - ماڵێکی قەراغ شار:

(( ساماڵ و دلێرو سەرخێڵ.. لەناو باخی پشتەوەی خانوویەکدا وەستاون))

ساماڵ: پێویست بەوە ناکا دلێر گیان، من چیت پێ ئەڵێم هەر ئەوە بکەو بەس.

دلێر: سەرچاو.. بەڵام چەکم پێویستە.

ساماڵ: نا، مۆبایلەکەت هەموو شتێکە.. تەنها بە پەلە خۆم ئاگادار بکەوەو هیچیتر.

دلێر: ئەی سەرخێڵ؟ ئەو بۆ ئەوە نەکات و من ئاگام لێت بێ.

ساماڵ: ئەگەر تۆ پێت ناکرێ ئاساییە دلێر گیان، تۆش لای من بە.. تەلەفون بۆ ڕێبین ئەکەم، ئەو بیکا.

دلێر: وەڵاهی ممنونیش ئەبم.. ئەو ئیشەم زۆر لەبەرگران بوو.. نەجاتتدام.

سەرخێڵ: ئێ زووتر قسەت بکردایە برا پێویستی بە ڕێبینیش نەبوو، من ئەمکردو تۆ لێرە بوویتایە.

ساماڵ(( مۆبایلەکەی دەرکردووە تێل بکا)): نا سەرخێڵ گیان، تۆش و دلێریشم لێرە پێویستە، نەک ئەو کچە هەڵەیەک بکا، ئەبێ زۆر زوو ڕاست بکرێتەوە.

(( ساماڵ تەلەفون بۆ ڕێبین ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٢٧١ – ڕ/ن – ئۆفیسی هەوراز:

(( هەوراز تەمەنی ٣٥ ساڵ، زۆر ناسک، سووروسپیی، قژ کاڵ و لولی ڤێری ورد.. لەگەڵ مریەم و عارف بە جلی غازفرۆشییەوە دانیشتوون))

مریەم: من نایانناسم عارف، ئەگەر ئەزانی چالاک و نهێنپارێزن و ئیشەکە مسۆگەرە، ئەوە بە متمانەی تۆوە ئەکەوینە ناوەوە.

عارف: من دڵنیام هەر کە زانیت سەرۆکی گروپەکە کێیە، متمانەت بەو زۆرتر ئەبێ.

مریەم: ئەی بۆ نایڵێی عارف؟ ئەبێ هەر دیدەوان بێ، لەناو خۆمانا ئەو ناسراوترین و دیارترینە.

عارف: من ناتوانم ناتوانم هیچ نهێنییەک بدرکێنم مریەم خان، تا پرسوجۆی خۆی نەکەم، خۆت سروشتی ئیشەکە باش ئەزانی.

هەوراز: کێشە نییە هەرکەسێکە با ببێ، من لەسەر قسەی مریەم خان مامەڵە لەگەڵ تۆیا ئەکەم.

مریەم: هەوراز گیان، وردەکاریی زۆرم پێویستە، ئەوەی ئێوە خۆتان لێداوە، سەرمایەی گەورەشی ئەوێ، با منیش چاوێک بە وەزعێ خۆما بخشێنمەوەو عارفیش قسەیەک لەگەڵ سەرۆکی باندەکەیا بکاتەوە، ئەوسا بڕیاری لێ ئەدەین.

هەوراز: خەمی سەرمایەت نەبێ، پێکەوە بەشداریی ئەکەین.

مریەم: با بزانین.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن دانیشتووە.. هاوکار بە پەلە دێت و دەست ئەگرێ بە لایەکی دەرگاکەوە.))

هاوکار(( بێ ئەوەی دەنگی دەربچێت)): هات! (( ئاماژە ئەکا کە گوڵەکەی پێ نییەو ئەچێتە دەرەوە، پاش کەمێک دیدەوان بێ گوڵ دێتە ژوورەوە، سڵاوی گەرم و نارەوەنیش گەرم))

نارەوەن: تازە فێری گوڵت کردووم، کوا گوڵەکەم؟

دیدەوان: گوڵ نابرێ بۆ گوڵ گیانی من.. ئێستا هەندێ گەنج وەستابوون گاڵتەیان پێکردم، ئەیانوت پیرەمێردەکە هەموو بەیانییەک گوڵ ئەبا بۆ یارەکەی.. دیارە بە گوڵی نازانێ بۆیە گوڵی بۆ ئەبا.. منیش لەوێ بۆم جێهێشتن.

نارەوەن: هەروا زوو قسەی خەڵک کارت تێ ئەکا؟ جا خۆ دواتر ڕەنگە بڵێن ئەم پیرێژنە چییە وای بۆ ئەکەیت و ئەمە کەی کۆمپانیاوەو ئەوە کوێیە لە کارمەند ئەچێ و....

دیدەوان: نا ئەمەیان جیاواز بوو.. قسەکەیان ڕاست بوو.. من کە خۆم بێم و گوڵ ببینم، چ پێویستیم بە بینینی گوڵ هەیە؟

نارەوەن: بۆ لە تۆ وایە خەڵک قسەیەک ئەکەن لە ڕاست نەچێ؟ وا جوان ئەیڕازێننەوە، یەکسەر بچێ بە ئەقڵتا.

دیدەوان: قسەی تۆیە.. پێم بڵێ چیت کرد؟

نارەوەن(( خۆی مشغوڵ ئەکا)): هیچ چوون بۆ سەردانی نەخۆش و کاتی قسەیان نەبوو.

دیدەوان: بەوەی باشە کاتت زۆر ماوە.

نارەوەن: ئەی تۆ؟

دیدەوان: پێموتی هەموو شتێک وەستاوە، تا مافیاکە ئەگەڕێتەوە.

نارەوەن: باشە ئەوە چاوەڕێی لەوە زیاترت هەبێ، وا سەیارەیەک ناکڕی؟

دیدەوان: پێویستیم بە سەیارە نییە بەساقە.. من بەو بە پێ ڕۆشتنە یەک دنیا نەخۆشیم لە کۆڵ خۆم کردۆتەوە.. خۆ ئێمەو مانان هیچ جۆرە وەرزشێ ناکەین.. گەر بە پێش نەڕۆین، ئەوە هەر ورگ ئەمانخوا.

نارەوەن: وەڵا من کۆمەڵێک جوڵەی زۆر قورس هەیە، مامۆستایەکی وەرزش پێیوتم هەموو ڕۆژێک سێجار ئەوە ئەکەم و خواردنیشم ڕێکخستووە.

دیدەوان: ئاخر بۆیە باش ماویتەوە.. بە ڕاستی زۆرێک لەبەر ورگ ناتوانن جوڵە بکەن، هەمووی بەهۆی زۆر بەکارهێنانی سەیارەوەیە.. من بەمشێوەیە زۆر باشم.

نارەوەن: یاخوا هەر باش بیت.. بەڵام سەیارەش پێویستییە.

دیدەوان: کچێ بۆ ئەوەش باشە خەڵک نەزانێ هەبوویت!

Cut

دیمەنی – ١٢٧٣ – ڕ/ د – بەر کارگەی نیگار:

(( دڵنیا لە بەردەمی کارگەکەداو لەناو سەیارەکە لە خانەی پشتەوە دانیشتووەو تێل ئەکا بێ تاقەتە))

دڵنیا: ئێ چی بکەم وەڵاهی خاوەنکارەکە ئیزنم نادا............... با بزانم تەلەفونی بۆ ئەکەم، هەرچەند بەخوا ئیشەکە هی ئەوە نییە یەک چرکە چییە جێی بهێڵم......... ئەی بەرخەکەم خۆت ناتوانی بیبەی بۆ خەستەخانەیەک؟ تەکسیەک بگرەو سواریکە، خۆ هەڵگرتنی ناوێ؟!

Cut

دیمەنی – ١٢٧٤ – ڕ/ن – ژوورەکەی دڵنیا:

(( ئارەزوو تێل ئەکا ))

ئارەزوو(( دەنگی بەرز)): کچێ ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ نەخێر ناتوانێ خۆی بڕوا، لە پێ کەوتووە.............. ئەی چۆن؟ تەلەفونم بۆ کاکەش کرد، وتی لە دەرەوەی شارم................. باشە ئەی ئەگەر شتێکی لێهات من چی بکەم؟ بڵێم توخوا جارێ هیچت لێ نەیەت تا دڵنیا لە ئیش ئەگەڕێتەوە، یان کاکم لە دەرەوەی شارەوە دێتەوە............ ئەرەوەڵا تەلەفونی بۆ بکەو بڵێ ئەگەر دەریشت کردووم هەر ئەبێ بگەڕێمەوە، دایکم وا ئەمرێ.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٥ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٢٧٣ –بەردەمی کارگەی نیگار:

(( دڵنیا تێل ئەکا))

دڵنیا: ئا بە قوربانی سەرچڵ گیانی خۆم بم، بەخوا شتێکی لێ بێ کاکم هەر ئەمکوژێ.

سەرچڵ(( دەنگ)): جا بەخوا ئیزنت بدا باشە.

دڵنیا: بەخوا ئیزنیشم نەدا من هەر ئەڕۆمەوە، با هیچم نەداتێ.

سەرچڵ: ئاخر ئەمجۆرە ئیشانە لەوە نییە دەرتکاو ببڕێتەوە، شتی تریشی بەدوادا دێت.

دڵنیا: کەیفی خۆیانە سەرچڵ گیان، بڵێ هەر سەعات بۆ سەعات و نیوێکی پێ ئەچێ.

سەرچڵ(( نائومێد)): باشە بزانم ئەڵێ چی، نەڕۆی تا تێلت بۆ ئەکەمەوە.

دڵنیا: دە خێراکە.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٦ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا لە ژوورەوە بێتاقەت دانیشتووەو ڕەمزی دێت بۆ لای))

ڕەمزی: لە کۆستکەوتە ئەچی، دوور لە عومری.

شەنیا: نەمئەزانی ئەوەندەم خۆش ئەوێ.. سەیرە دەستم ناچێتە هیچ ئیشێک.

ڕەمزی: منیش ئیشم پیا دانەداوی، تەنها ئەوەندە نەبێ دوای دەوام هەندێک پارە دێت، دوای ئەوەی ئەوان ئەڕۆن، فرێی بدەرە ژوورەکەوە.. خۆشم ئاگام لێت ئەبێ.

شەنیا: ئەی خۆت بۆ نایکەی؟ توخوا ئەمڕۆ تاقەتی هیچم نییە.

ڕەمزی: ئاخریەکەی دەردەعەشق بەتەواوەتیی لێیدای.. هەر خۆم پاڵەوان دەرچووم.. بزانە هیچ بە بای خەیاڵیشما دێت؟

شەنیا: دە وازم لێبێنە با بۆ خۆم هەر بیر بکەمەوە، مادام هیچ بەلآت نییە.

ڕەمزی: وەڵا خۆ نەبێتە قسەیەک، ئەزانی منیش خۆشم ئەوێ و دڵم ئەڵێ چارەنوسی من و ئەو پێکەوە ئەبێ و هەموو ئەوانیتر فڕێ ئەدەینە دەرەوە.

شەنیا: منیش هەست ئەکەم میانەتان زۆر گەرمەو ئەوسا منیش لە دەرەوەی گروپەکەتان ئەبم.

ڕەمزی(( پەنجەکانی بە گاڵتەوە لە سەری شەنیا گیر ئەکا)): ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ خۆت هەر پێشەنگ ئەبی.. من دڵم بە ئەقڵی تۆ زۆر خۆشە.. زوو زوو وریام ئەکەیتەوە.

شەنیا: ئای سەرم!! ئەوە بۆ وام لێ ئەکەی؟

ڕەمزی: باوەڕ بکە منیش زۆرم خۆش ئەوێی، بەلآم لە شێوەکەی ساماڵ نا.. هەر حەز ئەکەم بەردەوام لام بیت و هیچیتر.

شەنیا: کەس وەک ساماڵ ناتوانێ خۆشی بوێم.. ئەو دەرگایە بۆ تاهەتایە داخرا.

ڕەمزی: گروپەکەت خۆشتر ئەوێ یان ساماڵ؟

شەنیا: ڕاستت بوێ، ساماڵ.. بەڵام گروپەکە بەقەدەر خۆم.

ڕەمزی: هەی ئافەرین.. یەعنی ساماڵ لە خۆشت زیاتر! بۆ نمونە ئەگەر مەترسیی بێتە سەر تۆو بەهۆیەوە گروپەکە هەڵوەشێتەوە، چی ئەکەی؟

شەنیا: بێ بیرکردنەوە خۆم ئەکوژم.

ڕەمزی: ئەی ئەگەر بەهۆی تۆوە ساماڵ مەترسیی بێتە سەر؟

شەنیا: سەرچاوەی مەترسییەکە لە ڕەگەوە هەڵئەکێشم.

ڕەمزی: کەواتە تۆ پێت خۆشە بیکەی بە یەکێک لە سەرکردەکانی گروپ؟ (( زەنگی بۆ دێت)) بەڵێ؟ ........... جا توخوا ئەوە باسە تەلەفونم بۆ بکەی؟ خۆت یان یەکێک لەبری ئەو دانێ و ئەو با بچێ بەلای دایکییەوە.............. دە باش، خوات لەگەڵ.. ئێهـ لە چیدا بووین؟

شەنیا: کردنی ساماڵ بە سەرکردە، پرسیارت کرد.. منیش ئەڵێم.. ئەوە نییە خەریکی نزیککردنەوەیم لە خۆت.. ئەزانم توناى زۆر زۆر باشیشی هەیە.. ئەوەی پێ ئەکرێت کە بۆی دیاری ئەکەیت.

ڕەمزی: منیش بە نیازم لە خوارووی خۆمەوە سەرکردە بێت و هەموو کارەکانی من ئەو ڕایی بکا.. بەڵام ئەی ئەگەر پێی خوار دانا؟

شەنیا: ئەی بۆچی شووی پێ ئەکەم، بۆ ئەوەیە من و ئەو بە یەک دڵ لەگەڵتا بین، تۆ سەرچاوەی خێری خێر.

ڕەمزی: ئەی ئەگەر ئەوکاتە سەرەڕۆیی کرد؟

شەنیا: دڵنیابە ئەوە ڕوو نادا، منی زۆر خۆش ئەوێ.

ڕەمزی: مەبەستی قسەکەم تێبگە.

شەنیا: ئەگەر هەر کردی، پێت ئەڵێم وەرە لاشەکەیم بۆ بشارەوە.

ڕەمزی: تۆ هەموو سیفاتێکی سەرکردەییت تیایە شەنیا گیان. لە ئێستاوە سەرکردەبە، پێش ئازیزەکەی دڵیشت.

شەنیا((نازکردن)): نا هەردووکمان پێکەوە.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٧ – ڕ – ئێوارە / د – بەردوكانی شیرینیی:

(( ئەردەڵان دانیشتووە ئازاری هەیەو هەر دەست بۆ پشتە سەری ئەبا.. هاوڕێ دێت بۆ لای و چایەكی پێیە))

هاوڕێ: زۆر كەساس دیاری لە دوورەوە.. وتم با چایەكی بۆ بەرم لە ڕایی خوا.. ئەڵێی بەراویتەی.

ئەردەڵان: خێرت بنوسێ، وەڵا حەزم لێی بوو هاوڕێ.. ئەوە كاك حەمەخدرت نەبینیوە؟

هاوڕێ: ئەوەنە نابێ لەگەڵ تریفەخانا ڕۆشتنەوە.

ئەردەڵان: شتێك لە دڵمایە.. پێی بڵێ بەیانی هەرچۆنێك بووە، وا بكا لە دەرەوەی دوكانەكەم بمبینێ.

هاوڕێ: ئەی ناكرێ بە من بڵێی؟

ئەردەڵان: نا بەو نەبێ بە كەس كیشەم چارەسەر نابێ.. قەینا بەیانی با بیبینم.

هاوڕێ: باشە بەسەرچاو.. بەڵام تۆ زۆر نارەحەتی ئەردەڵان.. چ خێرتە؟

ئەردەڵان: بەخوا خۆشم نازانم هاوڕێ گیان.. ئەم پشتی سەرەمە، نازانم بریسكەی پیادێ؟ گرژ ئەبێ؟ نام چی؟ ئیتر وا هەر وردە وردە ئازاری زیاد ئەبێ.

هاوڕێ: ئەرێ هەر بۆ خۆشت نیت مردوت مرێ؟ دە بچۆ سەری دكتۆرێ بە.

ئەردەڵان: بەخوا ئیتر ڕاستیان وتووە، ئەوی نییە لە ماڵم، ئاگای نییە لە حاڵم.

هاوڕێ: ئەگەر پەكی پارەت كەوتووە خەمت نەبێ، هەمووی لەسەر من هەرچی تێ بچێ.

ئەردەڵان: سەری تۆ خۆش بێ، پەكی پارە نەكەوتووە هاوڕێ گیان.. ئەگەر توانیت زوو كاك حەمەخدرم بۆ بنێرە.. بەخوا پەكی ئەوم كەوتووە.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٨ – ش/ن – ماڵی لەتیف – ژوورێکی کۆنی هەژارانە:

(( ئاواو لەتیف زۆر باشە))

ئاوا: بێ شەرەفن، توشی بەڵایەکت ئەکەن.. واز بێنە هاتنەوەی چی؟

لەتیف: ئاخر کاکە ئاوا بە قوربانت بەخوا ئەزانم خەمی منتە.. بەڵام من نە جەڵتەم بێ و نەهیچ ئەڵەمێکم هەبێ، بۆ لە ماڵەوە بکەوم و تۆش لە موچەکە زیاتر ئەو هەمووەم بدەیتێ؟

ئاوا: کاک لەتیف، جوامێریی و پیاو چاکیی تۆ هەرچییەکی بۆ بکرێ هەر کەمە.. تۆ نەبوویتایە منیش بە دەردەکەی باوکم ئەچووم، تا یەکێ ئەیوت درۆیەو بۆی دروستکراوە، هەزاریتر ئەیوت کوڕی باوکیەتی هەرئەوەی لێ ئەوەشێتەوە.. من زۆر زۆر مەمنونی دەم و دەستپاکیی و ویژدانە زیندووەکەتم.. تۆ منت باش بە ئاگا هێنایەوە.

لەتیف: من هیچم نەکردووە کوڕی خۆم.. ئەوەندە نەبێ نەمتوانی ناپاکیت لەگەڵا بکەم.

ئاوا: جا ئەوە کەمە؟ تۆ ژیانی منت کڕیەوە.. منیش ئەوەی ئەیکەم بۆ بوژاندنەوەی تۆو خێزانەکەتە.. زۆریتریشت بۆ ئەکەم، بەڵام جارێ نابێ لە پڕا هەموو شتێ بکەین.

لەتیف(( پارەیەکی قەبە لە زەرفێکایە نیسانی ئاوای ئەدا)): بەڵام بەخوا ئەمە هەر زۆر زۆرە کاکە گیان، ویژدانم ناهێڵێ لێتی وەرگرم.

ئاوا: من بەردەوام ئاگام لێت ئەبێ و تەنها ماوەیەک خۆت بگرە لە ماڵەوەو دوایش کە هاتیە دەرەوە، مەیەرەوە بەلای کۆمپانیاکەیا، تا بزانین خوا بە چ لایەکیا ئەخا.

Cut

دیمەنی – ١٢٧٩ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان شانی لەسەر جێ دانیشتنی قەنەفە داداوە بە ئاراستەی هەندرێن، قاچی بەسەریەکا لە ژێر خۆی داناوەو هەندرێنیش هەردوو قاچی لە خوارەوەو بە ئاراستەی مناڵەکان و تافان))

هەندرێن: ئێوە سەعیەکەتان بکەن بابە، گوێ لە ئێمە مەگرن.

کلێپە: ئەوە نییە سەعی ئەکەین؟

باڵا (( ڕابواردن)): بۆ ئێوە باسی چیتان ئەکرد؟ ها؟

هەندرێن: ئەک ڕووی بابی پشیلەکە ڕەش بێ، یەعنی نازانی؟

باڵا: ئیتر دایکم چووەوە کۆمپانیاو باس هەر باسی ئیشە.

تافان: دە هەستن بچنە ئەودیو دەی.

کلێپە: هیچمان نەکردووە بۆ بچین؟

باڵا: توخوا باوکە با نەچین، ساردەو تافان خانیش ئاگری بۆ هەڵنەکردووین.

هەندرێن(( بەسوعبەتەوە، نوکە شەقیان لێ ئەداو خەندە)): هەستن بڕۆن قسەی دایکتان مەشکێنن.

باڵا (( هەڵئەسێ، بەخەندەوە)): ئاخر ئێمە جێتان بێڵین، ئێوە شەڕ ئەکەن هههه.

(( هەندرێن بە سوعبەتەوە تەکان ئەداتە بەر خۆی و ئەوان ڕائەکەن))

ــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ــــــــــ Cut ــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٢٨٠ – ش/ن – ماڵی حەمەخدر:

(( خدر دێتەوەو باوک و غەمگین و هەرمێ بەخێرهاتنەوەی ئەکەن))

خدر(( خەندە)): ها باوکە گیان ئەمڕۆش چووی بۆ لای دکتۆرەکەت؟

باوک(( دەنگی هەر نائاسایی و کزە)): بەڵێ کوڕم، وتی لە جومعەی داهاتووەوە ئیتر ئەتوانی ئاسایی قسە بکەی.. کورە ئەوەنە چووم ئێستا بەقەد خۆی لێ ئەزانم. هههە.

هەرمێ: کاکە پۆڵا .......

خدر(( خەندە)): کچێ ئەو پۆڵایە تەرککە، دارودیوار گوێی هەیە.

غەمگین: بەخوا منیش دایم پێی ئەڵێم.

هەرمێ(( سوعبەت)): عەفو عەفو کاکەحمە خدر.. ئەمڕۆ لای دکتۆرەکە دانیشتبووین، چاوی ئەگێڕا.. با بزانی هههە.

خدر: ئەوەش ئەکەی باوکە؟

باوک(( بزە)): درۆ ئەکا، چاوم بۆ ئەوە نەگێڕاوە، وتم نەک یەکیان ناسیاوبێ.

هەرمێ: ئەها خوا هەردووچاوم کوێرکا درۆ ناکەم.

خدر(( سوعبەت)): ئێ قەیچێکا، ئەویش حەزی لە ژنە.. ئەی ئەو عالەمە بۆ حەزی لێیەتی و کەسیش قسە ناکا؟

غەمگین: وەڵا منیش بینیم.. تازە ئەبێ هەوڵی بۆ بدەین.

باوک: دە ئازابن و یەکێکی ڕێک و پێکم بۆ بدۆزنەوە.

خدر: تەواوە وەی بەسەرچاو.. (( بۆ باوک)) باوکە من ئەم ماوەیە شەوان لای دۆستێک ئەمێنمەوە، ڕەنگە نەیەمەوە، دایکی زۆر هیلاکە، ئەڵێم خوانەخواست نەک بمرێ، هاوکارییەکی بکەم.

باوک: جا ئەوە خێرە کوڕم.. قەیچێکا.. بەدڵی خۆت، تا پێویستیی پێت بێ، لای ئەو بە.. خەمی ئێمەت نەبێ.. زۆرین.

خدر: غەمگین گیان ماڵەکە بە تۆ ئەسپێرم.. هەر شتێک بوو، یەک زەنگم بۆ بکەو هیچیتر.. لەو شوقەیەی ئەوبەرەوە کۆمەڵێک هاوڕێم هەن، بەپەلە پێیان ئەڵێم بتانگەنێ.

غەمگین: خەمی ئێرەت نەبێ کاکە حەمەخدر.. هیچیش نابێ ئیشەڵا.

خدر: نا ئیشەڵڵا هیچ نابێ، شتیش بوو نەیدەیتە لارەملێ و عینادی، تەلەفونم بۆ بکە.

غەمگین: بەسەرچاو.

خدر: بەیانیانیش زوو سەرێ ئەدەمەوە.

Cut

دیمەنی – ١٢٨١ – ش/ن – ماڵی بروسک:

(( چیمەن خەریکی دایبی مناڵەکەیەتی.. بروسک بە پەلە دێتە ژوورەوە.. ))

بروسک: نیگار خان چاوی کردۆتەوەو قسە ئەکا.. من ئەچم بۆ خەستەخانە.

چیمەن: ئای خوایە، ئەی بۆ نابێ من بێم.

بروسک: بەساقەوبم وەک جاری پێشووت لێ دێتەوە، ئەوەتا من هەر هەواڵێکم دەست بکەوێ، بەخوا پێش ئەوەی بچم دێم بە تۆ ئەڵێم.

چیمەن: جا کەواتە بۆ هاتییەوەو عەزێتت کێشا.. هەر بە تەلەفون پێت بوتمایە.

بروسک: دڵەکەم دکتۆر وتی هەر هەواڵێکی خۆش یان ناخۆشت پێگەیاند، خۆت بەدیاریەوە بەو ئاگات لێی بێ وای لێ نەیەتەوە.

چیمەن: دەی ئاخر ئەو هەموو عەزێتەش؟

بروسک: گرنگ ئەوەیە ئێستا تۆ باشی؟ هەست بە هیچی خراپ ناکەی؟

چیمەن: نا بەساقەوبم خەمت نەبێ، هەر دڵخۆش بووم، ئەگینا هیچی خراپ هەست پێ ناکەم.

بروسک: دەی ئەڕۆم، زوو دێمەوە.

چیمەن: باشە گیان.

(( ڕۆشتنی بروسک))

Cut

دیمەنی – ١٢٨٢ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٢٧٩ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان))

تافان: وی بیسمیلا! جا من پەیوەندییم چییە بە نێوانی ئەوانەوە؟

هەندرێن: دەی ئیتر ئیش وایە چاوەکەم، سەرەتا تا ئەتناسن هەر تۆزێ سارد ئەبن، تا تێکەڵیی دروست ئەبێ و ئەوسا تۆش ئەبی بە یەکێک لەوان.

تافان: بەخوا باوەڕ ناکەم، ئەو ئاوایە زۆر ساردو هیچ دیارەو ژنەکەشی لەخۆی کرچ و کاڵتر.

هەندرێن: دەی ئەوە من چەند بە چەندە تێکەڵیانم، ئاوا بە ژەهری مارەوە ئەخورێت، بەڵام نازانم بۆ ژنەکەی.. ئەویش تازەیە لەو دەوروبەرە، ئەشێ وابێ.

تافان: ئەی خۆ درۆت لەگەڵ ناکەم، بۆ چوونە سەرئاویش ئەڵێ نەیەی بەلای تەوالێتی ژنەکەما... ئای خوایە (( ئەکێشێ بە ناوچەوانی خۆیا )) ئیتر ناوچەوانەکەیە وا قۆقزە، ئەگینا هەر ئاوڕێ بدەمە پەنجای وا ئەبێ ڕێم بۆ چۆڵکەن، بەڵام ئیتر ئەویش شانسی خۆی، مێردەکەی چاکە مێردەکەی. ئێمەش مێردمان هەیە.

هەندرێن: ئیتر لەگەڵ تۆیا هەرباسێک هەبێ، گڕ گڕ ئەبێ بیهێنیتەوە سەر من.

تافان: ئەی دە بڵێ وا نییە؟!

هەندرێن(( هەڵئەسێ )): لەگەڵ تۆیا زۆر وتن قورئان خۆشە.

Cut

دیمەنی – ١٢٨٣ – ش/ن – قاوشی نەخۆشخانەیەک:

(( دڵنیا تێل ئەکا ))

دڵنیا: نا شوکور زۆر باشە.............. هەر بەیانی دکتۆر هاتە سەری دەری ئەکەن، هیچ نەبوو زەختی زۆر دابەزیبوو.............. هەر لەگەڵ گەیاندمە ماڵەوە، تەلەفون بۆ سەیارەکە ئەکەم لە شوێنێک ئەیبینم.. خەمت نەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٢٨٤ – ش/ د – کۆڵانێک:

(( دوو کەس بە دوای دیدەوانەوەن.. لە شوێنێکدا سەیارەیەک نزیک ئەبێتەوەو دووکەسەکە بەروپشت لە دیدەوان ئەگرن))

کەس ١: بچۆ ئەو سەیارەیەوە.

# (( ئەڵقەی شەست و دوو))

دیدەوان: ئێوە کێن؟

کەس ٢: هەرکەسێک بین.. بچۆرە سەیارەکەوەو بێدەنگ دانیشە.

دیدەوان: نامکوژن؟

کەس ١: سەرکەوە درەنگمانە.

دیدەوان: باش!

(( دیدەوان سەرئەکەوێت و سەیارەکە دەرئەچێ))

Cut

دیمەنی – ١٢٨٥ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( نیگار بە نقەنق قسە ئەکا.. دەوران و تیرۆژو نارەوەن و تریفەو ئامۆ بە دیاریەوە وەستاون))

نیگار: توخوا بەڕاست پێم بڵێن!

دەوران(( دڵخۆش)): بەخوا ئەویش ماوە، تۆ جارێ خەمی خۆتت بێ، نەیوت نابێ زۆر قسە بکەی؟

نیگار: ئەی بۆ نایەت بۆ لام.

ئامۆ: ئەویش شکاویی هەیە ناتوانێ، کە باش بوون بچن بۆ لای یەک هههە.

نیگار: ئەک کوێراییم دایەت، شکاویەکەی زۆرە؟

نارەوەن: دەی هەر چاوت ساغە، تۆزێ لە چاویشت لەویش بکە.

نیگار: قەینا قەینا.. بەخوا زوبێر ئەهێنێ.

نارەوەن: ئیشەڵڵا سەلامەت ئەبی نیگار گیان.. زۆرم پێخۆش بوو، هاتیەوە هۆشی خۆت، ئیشەڵڵا بەمزووانە ئەگەڕێیتەوە ناومان.

تریفە: ئیشەڵڵا باشتر ئەبی دایە گیان.

نیگار: عەزێتتان کێشا.. بەقوربانتان بم.

تیرۆژ: من و دەوران هەر بە دیارتەوە ئەبین تا نەتبەینەوە بۆماڵەوە دەستبەردارت نابین.

Cut

دیمەنی – ١٢٨٦ – ڕ/ ژوورێک دیدەوانی تیایە:

(( دەستێکی دیدەوان بە کەللەپچەیەک بە یەدەی قەنەفە، یان شیشی پەنجەرەوە بەستراوەتەوە.. لەسەر قەنەفەکە دوو بەتانیی و سەرینێک هەیە، تەپڵەکێک هیچی لەسەر نییە، یەک کورسی هەیە))

**دیدەوان مۆنۆلۆژی ناوەوە:**

هەرکەس بن، نەزانن، هههە، دەستی من بۆ ئەبەستنەوە، خۆ پاڵەوانی بۆکسێن نیم؟.. بەڵام ئەبێ کێ لە فڕاندنم سوودمەند بێ؟ سەیرە.. جاری پیس شێواوم، ڕەنگە هی برسێتییەکەم بێ.. کافربابانە پارووەکیشم نادەنێ.. ڕەنگە بیانەوێ لە برسا بمکوژن هههە.. هەموو شتێ ڕێی تێ ئەچێ.

**مۆنۆلۆژ تەواو:**

دیدەوان(( دەنگی بەرز)): هێی کورە! کێ لێرەیە؟.. برسیمە برسی شتێکم بۆ بێنن بیخۆم.. با بە تێروتەسەلیی قسە بکەین... (( جواب نییە)) ڕەنگە هەر دەرگایان داخستبێ و ڕۆشتبن.. قەیچێکا، هیچ هیچ!

Cut

دیمەنی – ١٢٨٧ – ڕ/ د – بەر کارگەی نیگار:

(( ڕەمزی وەستاوەو تێل ئەکات، شەنیا دێت و لایەوە ئەوەستێت))

ڕەمزی(( تێل)): باشە عەزێتی مەدەن.. نا نا دەستی بکەنەوەو چا بخەنە بەردەستی و خواردنی شاهانەی بۆ بێنن.. ئەم ماوەیە خزمەتی باشی بکەن.. تا خۆم دێم هیچی لەگەڵا باس مەکەن. (( دایئەخاتەوە))

شەنیا: یەعنی زیندوو بۆوە.

ڕەمزی: خەمت نەبێ، هەر ئێستا بێتەوە سەر ئیشەکەی، بە شەش مانگیتریش نایەتەوە.. ئەگەر پێشت خۆشە نەیەتەوە.. یەک دەرزی بۆ ئەکەین.

شەنیا: نا توخوا.. چاکەی زۆرە بەسەرمەوە.. ئەو تۆی بە من ناساند.

ڕەمزی(( خەریکە سەربکەوێ و شەنیاش لەودیوەوە)): ئەوە ناپرسی کێیە ئەم ماوەیە میوانمان ئەبێ؟

شەنیا: نەء، کاری خۆتە، پەیوەندیی بە منەوە نییە.. بەڵام بەخوا زۆرم پێ ناخۆشە ئەو ئامۆ کەللە بەرانە ئەبینم.. ڕقم زۆر لێیەتی.

ڕەمزی: ئای دنیا!! کەڵە ئاسکەکەت بوو بە کەللەبەران؟

شەنیا(( بزە)): کورە هەر زۆر خراپتریش.

(( سەرئەکەون و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٢٨٨ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( خدر دێت بۆ لای هاوڕێ))

خدر: نەتپرسی بۆ نەکراوەتەوە؟

هاوڕێ: نەوەڵا کاکە حەمەخدر، لە کێ بپرسم؟ ئەو هەتیوە ڕەزاقورسەکەی لەگەڵیشیایە، نەهاتووە.

خدر: سەیرە قەت وا دوانەکەوتووە، ئەو بەیانیان پێش من، لە دوکانە.

هاوڕێ: ئەرەوەڵا.. بەخوا ڕەنگە چووبێ بۆ خەستەخانە، هاواری پشتە سەری بوو.

خدر: وایە بێتاقەت بوو.. بەو هیوایەی سەلامەت بێ.

هاوڕێ: ئیشەڵڵا.. ئەگەر بۆ ئەو شتەی وتی مەبەستتە،ماڵەکەی ئەزانم.. هەر خۆیەتی لە خانوویەکی بچکۆلەیا.

خدر: ئەوە پێویستەو خۆ هەر ئەبێ بشزانین بۆ دیار نییە.. ئەگەر تا سەعاتێکیتر دەرنەکەوت، پێکەوە ئەچین.

هاوڕێ: من لە خزمەتتام، بەسەرچاو.

(( ڕۆشتنی خدر بۆ ئۆفیسی وەکالەت))

Cut

دیمەنی – ١٢٨٩ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( تافان بە قۆری کارەبایی دوو چای تی باگ تێ ئەکات و ئەیبات بۆ ژوورەکەی نینا.. نینا کە چاوی لێیە لە کامێرای چاودێرییەوە، هەڵئەسێت بەرەو ژووری ئاوا، لە ڕاڕەوەکە یەکتر ئەبینن))

نینا: ئەوە بۆ لە جێیەکەت هەستاوی؟

تافان: ئەی با پێکەوە چایەک بخۆینەوە، بێ ئیش بووم وتم خۆشە دەمەتەقێیەکیش بکەین پێکەوە.

نینا: ئێرە جێی ئیشە تافان خان جێی دەمەتەقێ نییە، ئاواش پێی وتووی بە هیچ جۆرێک جێی خۆت چۆڵ نەکەی، هەست ناکەی سەرپێچییە؟

تافان: جا من لەبەر خاتری تۆ هەستاوم، چام بۆ هێنای.

نینا: خاترت خۆش بێ و ماڵت ئاوا بێ.. ئەگەر ئاوا قسەیەک بکا، من بڵێم ئاگام لێی نییەو لە خۆیەوە چاکەی هێناوە؟ ئەوە بۆ تۆ خۆش ئەکەوێتەوە؟

تافان: وەڵا ئیتر ئەو شتانەش هەیە لەسەر ئیش، چایەکەو نانێکەو ئەی بڵێم چی؟ هەروا دەم بە قوتەوە بگرین؟

نینا: چاکەت بەرەوە جێی خۆی و تکایە جارێکیتر شوێنی خۆت جێمەهێڵە، من هەرچییەکم پێویست بێ، لە کەسی خۆی داوا ئەکەم.. فەرموو.

تافان: بەڵام نەریتی ئێمە وا نییە بەو ڕەقییە دەستاوی هاوڕێکەت ڕەتکەیتەوە.

نینا: ببورە، من نەریت ناناسم.. لێرەش کارمەندین پێکەوە نەک هاوڕێ.. فەرموو بۆ جێی خۆت.

تافان: وی دایە!!!!

(( نینا لە پشتیەوە سەیری ئەکاو بزەی تەنزانە.))

Cut

دیمەنی – ١٢٩٠ –ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن دێتە ژوورەوەو بانگی هاوکار ئەکا، یان زەنگ لێ ئەدا.. هاوکار دێتە ژوورەوە))

نارەوەن: ئەوە هەردی لە کوێیە، بۆ بەدەنگمەوە نەهات.

هاکار: ئەمرکە نارەوەن خان، هەردی چوو بۆ سۆراخی کاک دیدەوان، نەهاتووە تا ئێستا.

نارەوەن: جا هەڵبەت ئیشێکی هەبووە بۆیە نەهاتووە، ئەم بۆ ئەچێ بەدوایا؟

هاوکار: وتی کاک دیدەوان خۆی پێیوتووم ئەگەر هەر ڕۆژێک سەعاتێک دواکەوتم، وەرە بە سۆراخمەوە.

((ڕەمزی بە پڕتاو دێتە ژوورەوە))

نارەوەن(( خەندە)): ئەوە خێر وا بە پڕتاو؟

ڕەمزی: باشی نارەوەن خان؟

نارەوەن: خوا سەلامەتتکا کاک ڕەمزی.

ڕەمزی: کاک دیدەوان لێرەش نییە؟

نارەوەن: نەوەڵا منیش ئێستا هاتم، وتیان نەهاتووەو ئەو کوڕەی لای خۆشمان چووە بە سۆراخییەوە.. ڕەنگە ئیشێکی ناو بازاڕی هەبێت، فەرموو دانیشە ئێستا پەیا ئەبێ.

ڕەمزی: نا من تەبیعەتی ئەو ئەناسم وا نییە.. بچووایە بەدەم ئیشێکەوە، تەلەفوونی بۆ من ئەکرد، تا توشی دڵەڕاوکێ نەبین.

نارەوەن: ئەی ئەبێ چی بێ؟

ڕەمزی: نازانم خوا ڕەحمکا.. ئەچم بە دوایا ئەگەڕێم. (( ئەڕوات))

نارەوەن: تۆ وەرە کاک ڕەمزی چایەک بفەرموو!

ڕەمزی: کاتی نییە خانم، بۆ جارێکیتر.

نارەوەن: تۆ بڵێی شتێک ڕوویدابێ؟ باوەڕ ناکەم.

هاوکار: چات بۆ بێنم؟

نارەوەن: ئا باوکە گیان چاکەی خۆم.

هاوکار: بەسەرچاو.

(( هاوکار ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٢٩١ – ڕ/ن – ژوورەکەی دیدەوان:

((قۆرییەکی کارەبایی و شەکرو چای تی باگ لەسەر تەپڵەکیک.. دیدەوان هەستاوەو چا تێئەکا، کەلەپچەی بەدەستەوە نەماوە.. زاهید دەمامکدارەو دێتە ژوورەوە))

زاهید: بە هیواین لێمان زوویر نەبی، دەستت بەسترابۆوە.. ئێستا ئەمرکە بەڕێز، بۆ نانی بەیانیی چی ئەفەرمووی؟.. هێلکەو ڕۆن، پەنیری کرافت و سێگۆشەو کیریی.. گوێزو هەنگوین و قەیماغ.. لە خزمەتداین.

دیدەوان: دیارە من لە چاخانەیەک دەستبەسەر کراوم.

زاهید: نا.. سەهوت کرد، چێشتخانەیە.. نیوەڕۆش بە دڵی خۆت داوابکە.. ئیتر فەرمانەکە وایە، خۆ بەدەست من نییە نان و شەقت بەمێ.

دیدەوان: ئەها!! کەوابێ سوپاس بۆ گەورەکەت.

زاهید: ئێستا بفەرموو.

دیدەوان: هەمووی بێنەو دوو شیش جگەریش.

زاهید(( گاڵتەپێکردن و دەست ئەبا بۆ ورگی دیدەوان )): جا ئەو هەمووەت بۆ ئەخورێ خرەباوانم؟

دیدەوان: تۆ داوات لە من کردو منیش ئەوانەم ئەوێ، ئەگەر نەیهێنیت مان ئەگرم و نان ناخۆم.

زاهید(( قاقای پێکەنین)): کورە کەرە تۆ دوعا بکەو لە خوا بپاڕێوە نەکوژرێی.. بۆ وا ئەزانی لە کوێ لاتداوە؟

دیدەوان: بە لوتفەکەتا دیارە ناکوژرێم.. بچۆ بیانهێنەو زیاتر مەڵێ.

زاهید: بەڵێ باشە بەگم.

(( زاهید ئەچێتە دەرەوەو دیدەوان خەندە))

دیدەوان: ئەمە یەک... ڕەنگە خراپ نەبێ.. دڵنیا بوومەوە پۆلیس نیین.. پۆلیس ئەوەنە بەدەست و دڵ نییە.. زۆر خراپیش نیین و وەک ئەوە وایە کاری خێریان پێم بێ.. جا چییە؟ ئەوەیان اللە یعلم!

(( چاکەی تێ ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٢٩٢ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ وەستاوەو هەندرێن دێت داوای چا ئەکا ))

هاوڕێ: ئەوە لە خوا بەزیاد بێ تافان خان چووە لای کاک ئاوا؟

هەندرێن: ئەرەوەڵا مامە هاوڕێ خۆم داوام لێ کردن، فەقیرە لەماڵەوە زۆر بێتاقەت بوو.

هاوڕێ: ئەی خۆ شوکر مناڵەکان ئەوە هەن، خۆیان بەڕێ بکەن؟!

هەندرێن: ئا ئا خوا نەیبڕێ کوڕەکە گەورەیەو کچەکەش وریایە.. ئەم نانیان بۆ دائەنێ ئیتر پەنیرو ماست و شتی وا تا خۆی ئەڕواتەوەو ئەوانیش کە هاتنەوە، خۆیان تێر ئەکەن و ئەخەون.

هاوڕێ: ئەک خوا نەیبڕێ، هەر ئاگاتان لێ بێ نەچن بەلای ئاگراو هیچیتر.(( خدر بەوێدا ئەڕوا )) کاک حەمە خدر، ئەڵێم نەچین؟

خدر: دێمەوە هاوڕێ گیان ئیشێکم هەیە زۆرم پێ ناچێ.

هاوڕێ: باشە چاوەڕێت ئەکەم.

خدر: ئەی خۆت بۆ ناچی؟

هاوڕێ: نەوەڵا با پێکەوە بچین.

خدر: باشە.. وا ئەکەم زوو بێمەوە.. بەڵکو خۆیشی دەرکەوێ.

هاوڕێ: بەشکو!!

هەندرێن: خێر؟ نیازی کوێتان هەیە؟

هاوڕێ: ئەردەڵان ئەمڕۆ نەهاتووەو مۆبایلیشی داخراوە.. ئەچین بزانین چ خەبەرە؟

Cut

دیمەنی – ١٢٩٣ –ڕ/د – ناو باخی دەرەوەی شار:

(( سەرخێڵی تەمەن ٢٤ساڵ و ساماڵ))

ساماڵ: کچێکی چۆنە؟

سەرخێڵ: ئاوا باریکەیەکی جوانە، باڵا بەرز نییەو کورتیش نییە.

ساماڵ: وا لە هیچ تێ ناگەین.. تۆ ڕەسمێکیم بۆ بگرە ئەتوانی؟

سەرخێڵ: ئاسانە، بەسەرچاو.

ساماڵ: ڕەنگە گومانیان کردبێ سەفەرم نەکردبێ و ئەو چەتیوەیان دواخستووە، تا بزانن شەنیا دێت بۆلام؟ ئەی هەفتەی داهاتوو چۆن شەنیا ئەهێنی؟.. من بە تەلەفون پێموت ژمارەی تۆی ئەدەمێ و قسە بکەن و بە قسەت بکا.

سەرخێڵ: ئا ئەبێ من ئەو ماڵەی پێ بڵێم کە بۆی بچێت.. ماڵەکە سەرەوەی لە کۆڵانێکایەو دەرگای ژێر زەمینەکەی لە کۆڵانێکیترا.. خانوویەک نێوانیانە، کەس نازانێ خانووی ئەو دوو کۆڵانە پێکەوە یەک ماڵە.

ساماڵ: ئەها.. لەم کۆڵانەوە بچێتە ژوورەوەو.........

سەرخێڵ: بەڵێ من لە دەرگاکەیترەوە ئەیهێنم، خەمت نەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٢٩٤ – ڕ / د – ناو سەیارەی خدر:

(( خدر شۆفێرو نارەوەن لە تەنیشتی))

نارەوەن: باشە ئێستا من چی بکەم؟ هەر دەوام بکەم؟ یان دایخەم و چاوەڕێی ئەو بکەم؟

خدر: ڕەنگە هەر ئەسڵ و ئەساسیشی نەبێ و نەگیرابێ و نە فڕێنرابێتیش.. تاکتیکە.. من وای تێئەگەم.. ڕەنگە ئێستا لە ماڵی ڕەمزی بێ دوور نییە؟

نارەوەن: حاڵەتەکەی من زۆر هەستیارە ئێستا، نازانم چی بکەم؟

خدر: هیچ مەکە.. بچۆرەوە سەر ئیشی خۆت و تێ ئەگەین چییان بە دەستەوەیە، بە داخستنەکەی هیچمان دەست ناکەوێ.

نارەوەن: یەعنی بەڕای تۆ، ئەو ون ئەکەن و یەکێکیتر ئەهێننە پێشەوە؟

خدر: دیدەوان تەواوی قاچاخچێتییەکەی پێوتووی، ئێستا هاتۆتە سەر جێبەجێ کردن و خۆی ئەشارێتەوە، پێشی وتوی، تا دەرکەوتنەوەی مافیاکە هیچ ناکرێ.. کەواتە لە دەست تۆ خۆی شاردۆتەوە، تا فشاری زیاتری نەخەیتە سەری و قسەی تری لێ دەرنەپەڕێ.

نارەوەن: ئەی چۆن بە بەردەوام بوونی من، شتی زیاتر دەرئەکەوێ؟

خدر: مەرج نییە ئەو  بۆ چوونەی ئێمە ڕاست بێ.. ڕەنگە شتیتریش هەبێ، بە ون بوونی تۆش، ئەوەندەیتر دوورئەکەوینەوە لە ئەنجامەکە.

نارەوەن: باشە.. کەواتە بمبەرەوە بۆ ئەوێ.

خدر: وا باشترە.. منیش بچم بە سۆراخی ئەردەڵانەکەوە.. هەر خوا بکا ئەو دوو ون بوونە پەیوەندییان پێکەوە نەبێ. (( زەنگی بۆ دێت)) ئەلو هەرمێلە گیان! ............. (( شڵەژان)) ئەی غەمگین لە ماڵ نییە؟ ................ دەی ئێستا دێمەوە بەقوربان، دەرگا لە کەس مەکەرەوە تا ئەگەم.......... چاوەکەمی خوات لەگەڵ.

نارەوەن: چی ڕوویداوە با منیش بێم.

خدر: ئا ئا پێکەوە بجین باشترە، نەک چاودێریی بێ، با وا خۆما نیشاندەین کە پێکەوەین باشترە..

نارەوەن: باش.. ئەی چی بووە؟

خدر: ئەڵێ کابرایەک هاتووە داوای مشاری کردووەو پێم وتووە نیمانە، کەچی دەرگاکەشم داخستۆتەوەو ناڕوا.. لە کونی دەرگاکەوە زانیویەتی.

نارەوەن: دەبڕۆ بڕۆ حەمەخدر گیان، تەنیایە؟ وا ئەترسێ؟

خدر: ئای! غەمگین باوکمی بردووە بۆ لای دکتۆرەکەی.

نارەوەن: دە ناهەقی نییە.

Cut

دیمەنی – ١٢٩٥ – ڕ/ د – بەردەرگای کۆمپانیای ئاوا:

(( ئەحە ئەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیاو تافان دێتە دەرەوە))

تافان: لە جێیەکەم دانیشە نایەمەوە ئیزنم خواستووە.

ئەحە (( وشک، ئەڕوات)): من ئیشم هەیە، ناتوانم ئیشی خۆتە.

تافان: وەی خەم!!!

(( کەمێک ئەڕوات))

**<u>تافان مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە</u>:**

بێ عەمەل لەگەڵما وشک و خراپن!!!! تۆ بڵێی ئەو کەچەڵە بۆ هەموویانی گێڕابێتەوە؟ چاوی دەرئەهات، هیچی هەڵەم نەکردووە، بە مێشکە بۆگەنەکەی خۆیشی چۆنی لێک ئەداتەوەو چۆن و بۆ کێی ئەگێڕێتەوە ملی ئەشکا.. بەخوا بەخوا یەک قسەی کردبێ، بە ڕێبوار ئەڵێم لە بری ئەو چەتیوە ڕشکنە، ڕێگەیەک بدۆزێتەوە ئەو بکوژین.. دەی خوام لەو خوایەی دەمی بە خراپ لەسەر من هەڵهێنابێتەوە..

**<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو</u>:**

(( تەلەفون دەرئەهێنێت و بەدوای ژمارەیا ئەگەڕێ))

———————————— Cut ————————————

دیمەنی – ١٢٩٦ – ڕ / د – بەر کارگەی نیگار:

Mute

(( شەنیا لە کارگە دێتە دەرەوە، دڵنیا ڕەسمی ئەگرێت و لەو کاتەشدا سەرخێڵ کاتی وێنەگرتنەکەی ئەگرێت لە سەیارەیەکی تردایەو چەند وێنەیەکیتریشی ئەگرێ کە دوای شەنیا ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٢٩٧ – ڕ/ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( زاهید بە دەمامکەوەو کێردێکی گەورەی پێیەو بە ناولەپیا ئەهێنێ.. دیدەوان شڵەژاو لە دیمەنەکەدا))

دیدەوان: بە گەورەت بڵێ کوشتن نا.. چەندی پارە ئەوێ ئەیدەمێ و هەر گەڕاشمەوە نارەوەن دەرئەکەم.

زاهید: ئەو نە باسی دەرکردنی کردووەو نە پارە.. ئەڵێ زۆر بە ڕێزەوە بیکوژە، چونکە بە نیازی نارەوەنە.

دیدەوان: تکایە دەرفەتێکم بدەرێ و تەنها ئەمجارە پێی بڵێ.. بەڵێنتان ئەدەمێ بە هیچ جۆرێک هیچ قسەیەکی لەگەڵ ناکەم و ئەگەر مەبەستیانە، هەر کۆمپانیاکەشی پێ ئەبەخشم و دوور دوور ئەکەومەوە.

زاهید: من هیچم بەدەست نییە.. شانسی خۆت هاتووەو لەودیوە، ئەگەر نەهاتایە، بە ڕێزەوە فەرمانەکەیم جێبەجێ ئەکرد.

دیدەوان: بەقوربانی تۆ بم، سوپاست ئەکەم، توخوا ئەو کێردەش مەهێنەرەوە، لێی تۆقیوم.

زاهید: جا بۆ حەز لەم و لەو ئەکەی، نەتئەزانی کێردی لە پشتەوەیە.

دیدەوان: تۆبە دەخیلتم.. بەخوا من لە ژنهێنان نیم.. ئەوە تەنها ئیشێک بوو.. جا چیتان تێگەیەنم برا؟.. هەر لێیگەڕێ.

زاهید: با بچم پێی بڵێم.

(( زاهید ئەچێتە دەرەوەو دیدەوان ئەکەوێتە سەر ئەژنۆو نزا ئەکا))

—————— تابع —————— Cut ——————

دیمەنی – ١٢٩٨ – متبوع – ڕ/ ن - ژووریێکیتر:

(( زهید ئەچێتە ژووریێکیتر.. ڕەمزی و سەرچڵ دانیشتوون.. دەرگا دائەخات و پێ ئەکەنێ))

زاهید: هەر تۆقیوە.. ژانم کرد لە پێکەنینا.. ناردوومی چەند پارەت ئەوێ بتدەمێ و دەست لە نارەوەن هەڵئەگرێ و کۆمپانیاکەش ئەکا بە ناوی ئەوەوە، بەس نەیکوژم.. بە کوڕەکانی نارەوەن تێگەیشتووە.

ڕەمزی: واو واو کە باشە.. ئەوە پلانەکانی خۆیەتی دێتەوە ڕێگەی، زۆر زۆر باشە.. بە تیرێک دوو نیشان بپێکین.. ئەگەر ئازادی بکەین، بەر ئەبێتە کوڕی نارەوەن.. ئەوانیش لە تاوی کێشەی خۆیان، خدر بۆ من جێ ئەهێڵن (( چەپڵە لێئەدا ))

سەرچڵ: پیاوی ئاقڵ هەر ببێ باشە.. پیرۆزە.

ڕەمزی: بچۆ پێی بڵێ.. کۆمپانیامان ناوێ.. ئەو ژنەش با هەر لەو کۆمپانیایەی کاک ڕەمزی بێ.. بەڵام بە تیلە جاویش سەیری بکەی، هەردوو چاوت هەڵئەکۆڵین.

زاهید: سەرچاو. ئێستا پێی ئەڵێم.

ڕەمزی(( پەست)): دەوەرە تا ئێستا گەلحۆی وا سەرۆکت بووبێ.. جا خۆ چوار شەقی تێهەڵدرێ، گروپ ئەخاتە سەر ساجی عەلی و هەرچیمان هەیەو نییە ئەیبەخشێ.. تف.. سوکی ڕیسوا... ئاااای لەو هەموو ترسنۆکییە؟!

سەرچڵ: بەزاتی خوا هەر بۆ ئەوە باشە، بۆ ئەوەی ژەمێکی بدەنێ، لەبەردەرگای ئەم چێشتخانەو ئەو چێشتخانەدا بکەوێ و سەرمێز پاککاتەوەو بڵێ خاوەن چێشتخانە برادەرمە.... کەی بەشەرە ئەی هاوار!؟

Cut

دیمەنی – ١٢٩٩ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی خدر:

(( خدرو نارەوەن چاو بە قادرمەکان و دەرەوەدا ئەگێڕن و لە جەڕەس ئەدەن و هەرمێ دەرگا ئەکاتەوەو ئەوان لە پەنجەرەی سەر قادرمەکانەوە چاو ئەگێڕن))

هەرمێ: ڕۆشت کاکە!

خدر: لە کوێوە ڕۆشت؟

هەرمێ: وەڵا نازانم، هەر چووە (( ئاماژەی بەرامبەر ئەکا)) ئەو ماڵەش داوای کردو ئەوان هەیانبوو، ئیتر وەریگرت و منیش سەیرم نەکرد بزانم بۆ کوێوە ئەچێ.

خدر(( پێکەنین)): هەرمێلە گیان شار وایە، خەڵک پێویستیی بە هەر شتێ بێ، ئەچێ لە ماڵە دراوسێی داوا ئەکا.. دوایی تۆش فێر ئەبی.

هەرمێ: وەڵا من لە ڕووم نایەت.

نارەوەن: پەلە مەکە ئەگەر حەمەخدر هەموو شتێکت بۆ دابین نەکا، تۆش فێر ئەبی.

خدر: گوێت لێ بوو؟ کەواتە ئەبێ هەمووی دابینکەم هههە.. دەفەرموو نارەخان با بچینە ژوورەوە.

نارەوەن: نەوەڵا ئەگەر کچەکە ترسی ڕەویوەتەوە، بمگەیەنی باشترە، سەیارەکەشم هەر لەوێیە.

Cut

دیمەنی – ١٣٠٠ - ڕ/ د – پارک:

(( تافان بەردەوام چاوئەگێڕێ و ڕێبوار ئاساییە))

ڕێبوار: منیش قەناعەتم وایە شتێک هەبێ.. ئەگینا بۆ وا ئەبن لەگەڵتا؟.. تۆ لەو بڕوایەدای ئەو خدرە قسەی کردبێ؟

تافان: نازانم.. ئەوەنە ئەزانم مەحاڵە بهێڵن ئەوە بکەم کە ئەتانەوێ.. کاکە هیچ شتێکی دەستم وەرناگرێ.. ڕەنگە بە گلاوم بزانن.

ڕێبوار: دەی ئەوانیش خێزانە دەوڵەمەندە پارێزگارەکانن.. هەر بەڕاست بەم جل و بەرگ و ڕوخسارەوە، ڕەنگە حەز بە وەرگرتنی خواردنی دەستت نەکەن.

تافان: سەرم بخوا هەر ئەوە شک ئەبەم و بە حسابی خۆشم ئەمانە ڕاقیترینن.. ئەی چی بکەم؟

ڕێبوار: ئەگەر ئەتوانی نەهێڵی ببێتە کێشە لەگەڵ هەندرێنا؟.. ئێستا من چارەسەرت ئەکەم، بە جۆرێک خۆت نەناسیتەوە.

تافان: ئاوا؟؟؟؟؟؟

ڕێبوار: لەماڵەوە بە شتێک پینەیکەو ئەچینە بازاڕ.

تافان: ئا.. ئەڵێم لە پارەی پاشەکەوتکراوی خۆم کڕیومە.. ئەو قەت نازانێ چەندم هەیە.

ڕێبوار: من خەمی خۆتمەو نەتهێنێتەوە سەر من بڵێ بۆ جلی بۆ ئەکڕی؟ هههههە

تافان: قوڕقوشمیش بکا بە گەرووما ناوی تۆ نایەت.. لەوە دڵنیابە.

ڕێبوار: سوپاس، هەر ئەبێ وا بێ.

تافان: بڕۆ با بڕۆین، چی ئەبێ با ببێ.. هەر یەک دەس ئەکڕین؟

ڕێبوار: من سێ دەستی نایابی مارکەت پێشکەش ئەکەم و خۆشت حەزت لە هەرچییەکیتر کرد قسە بکە، قسەی تۆ ناشکێ.

تافان: بەڕای تۆ دوای ئەوە باش ئەبن لەگەڵما؟

ڕێبوار: ئەگەر باش نەبن، کەواتە خدرەکە قسەی درکاندووە.. بەوانی سەروو خۆشمەوە ئەڵێم، تاقیبێکی باشی ئەوەم بۆ بکەن.

تافان: ئا بە قوربانی ڕێبوار بم.. ببورە عەفو! بە قوربانی کاک ڕێبوار بم.

ڕێبوار: خوانەکا.. با بڕۆین تا درەنگی نەکردووە.

(( ڕۆشتن ))

Cut

دیمەنی – ١٣٠١ – ڕ/ د – چاپخانەکە:

(( هاوڕێ و سەفین و دڵە عەبەو هەندرێن چا ئەخۆنەوە))

هەندرێن: ئەرێ کارە هەر نەهاتەوە چیکرد؟

سەفین(( لەفە ئەخوا)): ئا عەبە بچۆ بزانە بۆ نەهاتەوە؟

هاوڕێ: نە بەقوربانە، عەبە خواخوای خۆدزینەوەیەتی، لێبگەڕێ سەفین گیان.

دڵە: من بچم؟

هاوڕێ(( تەماشای ئەوبەرەوە ئەکا)): باقڵم بینی ڕۆشتەوە کاک هەندرێن.. ڕەنگە کارە بەدوایا بگەڕێ هههە.

هەندرێن: دەی چاکەم ئەخۆم و خۆم ئەچم(( کارە دەرئەکەوێ))

هاوڕێ: ئەوە هاتەوە.

کارە: کاک هەندرێن نینا خان وتی سەعات زیاترە ئیزنی وەرگرتووەو ڕۆستۆتەوە.

هەندرێن: باشە بەساقەی کوڕ بم، زۆر سوپاس.

خدر(( لە سەیارەکەیەوە بانگی هاوڕێ ئەکا)): هاوڕێ بجوڵێ با بڕۆین.

هەندرێن: منیش بێم کاک حەمەخدر؟

خدر: تریفە لەوێیە؟

هەندرێن: بەڵێ.

خدر: دە یەکێکتان پێی بڵێن کە زۆرم پێ ناچێ، زوو دێینەوەو تۆش وەرە کەیفی خۆتە.

هەندرێن(( بە ڕاکردن بۆ لای تریفە)): بەسەرچاو، ئەها یەک دەقە.

(( هاوڕێ ئەچێتە سەیارەکەوە لە دواوەو هەندرێنیش دێت و ئەچێتە پێشەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣٠٢ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە:

(( ڕەمزی و نارەوەن))

ڕەمزی: هەر لەگەڵ حەمەخدرا بووی؟

نارەوەن: ئەتوانی لێی بپرسی! بۆ شتێک بووە؟

ڕەمزی: دیدەوان فڕێنراوە نارەوەن خان.. هەڵبەت بێ سەروو شوێنەو هیچ دەنگێکی نییە.

نارەوەن: ئەیڕۆ وا نەڵێی؟!

ڕەمزی: جا مەعلوم یەکێک بەرژەوەندیی لەو بێ سەروشوێن کردنەی هەیە.

نارەوەن: بە دڵنیایی وایە.. ئەی بە پۆلیستان وت؟

ڕەمزی: بەڵێ.. هاتوون پرسیارت لێ بکەن و تۆش لێرە نەبوویت.. ئەبێ خۆت ئامادەکەی ڕوونکردنەوەیەکی وایان بدەیتێ، قەناعەت بکەن.. ئەگینا وا بزانم بۆ تۆ باش ناکەوێتەوە.

نارەوەن: من شایەتیشم هەیە چووم بۆ کوێ و نەچووم بۆ ک..........

ڕەمزی(( قسەکەی ئەبڕێ)): ئەگەر شایەتەکەت حەمەخدر بێ، وابزانم گومان لەویش کراوە.

نارەوەن: بۆ بەرژەوەندیی ئێمە چییە لە فڕاندنی ئەو پیرەمێردە کاک ڕەمزی؟

ڕەمزی: پیرەمێردی چی نارەوەن خان؟ تۆ بە نیاز بووی شووی پێ بکەی.. ئەترسم حەمە خدریش هەر ئاوا کورت بێ؟!

نارەوەن: تۆزێ جوان قسە بکە کاک ڕەمزی، بزانە لەگەڵ کێیا قسە ئەکەی؟!

ڕەمزی: ئەگینا منیش ئەفڕێنی؟ وەڵا باوکم شاری بێ حاکمە ژنێک بکوژو ببڕە.

نارەوەن(( هەردوو دەستی توند گیر ئەکا لە قژی خۆی و کەمێک سەری پێ ئەخورێنێ بە خێرایی)): لە چ بنکەیەکە، تەلەفون بۆ حەمەخدریش ئەکەم، با ئەویش بێت وتەی خۆی بڵێ.

ڕەمزی: پەلە مەکە نارەوەن خان.. ئەگینا خراپ تێئەکەون.

نارەوەن: قسەی تۆ لە زیادەیە کاک ڕەمزی، هیچی لێ سەوز نابێ.. ئەچینە بنکەی پۆلیسەکەو وتەی خۆمان بە ڕەسمیی ئەڵێین، ئیتر چ پێویست بەم سەرێشەیە ئەکا؟ خۆ تۆ دادوەر نیت و منیش تاوانبار؟

ڕەمزی(( پێکەنینی زۆر)): هەی ئافەرین نارەوەن خان.. بەڕاستی وریاو مەردی.

نارەوەن: ئەو پێکەنینە دەسکردە چییە کاک ڕەمزی؟

ڕەمزی: ویستم کەمێک بتترسێنم، بەڵام دەرکەوت زۆر وریایت و چاوقایمیشیت!

نارەوەن: چاوقایمیی نییە کاک ڕەمزی! من چۆن ئەچمە ژێرباری تاوانێکەوە کە دوورونزیک ئاگاداری نەبم.. وەڵا لەسەر هەقی خۆم دەست ئەکەم بە چاوی هەموو گەورەترین کەسا.

ڕەمزی: بەڵام ئەو پیرەمێردەم پێخۆش بوو بە دیدەوانت وت، ئەو خۆی لا کوڕی سی ساڵەیە.

نارەوەن: منیش ئەو قسەیەم زۆر لەگیان گران بوو، کە وا ئەزانی من ئەمەوێ سیفەتی حەمەخدر لەبەرچاوتان بگۆڕم.. (( بزە)) با چاک بزانی، ئەوە قەرزێکت لایە.. بۆت لە پاروویەکی چەور ئەهاوم.

ڕەمزی: ببورە بۆ تەواوکاریی قسەکانم ئەوەم بۆ هات، تکایە بە جددی وەرمەگرە.

نارەوەن: سروشتی من بە جۆرێکە کاک ڕەمزی.. هەرگیز بە قسەیەک لە کەس نارەنجێم.. وەک خۆی قسەکەی پێ ئەڵێمەوە لە شوێنی خۆیدا.. بەڵام گەر دووبارەی کردەوە، هەڵوێستم ئەگۆڕێ.

ڕەمزی: بۆ نموونە چۆن ئەبێ.

نارەوەن: نازانم، بەڵام بە دڵنیاییی ئەم ژنە نابینیتەوە بەو ئەدایەوە.

ڕەمزی: ئۆو کەواتە تۆ هەر بەڕاست مەترسیداریت؟!

نارەوەن(( سەرئەبا بە پشتاو دەست بە ناوچەوانییەوە ئەگرێ قژ بۆ سەرەوە ئەبا )): ئۆو باوەڕ ناکەی لەگەڵ کینە لەسک و هەڵەکارا چەند ڕەق و بێ میزاجم.

ڕەمزی: من بۆ ئەوە نەهاتم هەڕەشەم لێبکەیت و سوکایەتیم پێ بکەی.. تازە میزاجم شێوا ئەمڕۆ.. سبەی دێمەوەو قسە لەسەر تەواوکردنی پرۆژەکەی تۆو دیدەوان ئەکەین ئەگەر نەهاتەوە.

نارەوەن: بۆ باسی پرۆژەی بۆ کردووی؟ من ئاگاداری هیچ نیم هاوسەرگیرییەکەمان نەبێ.

ڕەمزی: دەنگتان تۆمار کراوە، چۆن ئاگادار نیت؟

نارەوەن: تا خۆی نەیەتەوە من ناتوانم هیچ شتێ بکەم.

ڕەمزی(( تحدي )): وتم بەیانی دێمەوەو قسە ئەکەین.

نارەوەن(( پێکەنین )): ئەها چەند زوو تۆڵەم لێ کردیتەوە؟ هاهاها.

ڕەمزی(( وەک لە قافا گیرابێ ئیحراج )): ڕاست ئەکەیت.. کەواتە پاک و پیس زوو قەرزی خۆمم دایەوە.

نارەوەن: تۆ برای گەورەیت کاکە ڕەمزی، هەر بەڕاست گاڵتەم کرد، ئەگینا هیچیم لە دڵا نەبوو.. هەر ویستم سەری سوعبەتێ دامەزرێنین.

ڕەمزی(( دڵشکاو )): ئەمە سوعبەت بوو؟

Cut

دیمەنی – ١٣٠٣ – ڕ/ن – سالۆن:

(( تافان لە بەردەستی وەستای سالۆنەکەدایە))

وەستا: چیتر؟

تافان: هایلایتێکی جوانیشم بۆ بکە، بەڵام بیتەقێنێ باش؟

وەستا: چی بتەقێنێ؟

تافان: مەبەستم ئەوەیە زۆر زۆر عەجایب بێ.

وەستا: خەمت نەبێ شتێکت بۆ ئەکەم بە دڵی خۆت بێ پێشترو بە دڵی ئەو کاکەیەش بێ کە پارەکەت بۆ ئەدا.

تافان: مەمنونتم.

(( خەریکی قژی تافان ئەبێ))

Cut

دیمەنی – ١٣٠٤ – ڕ/ د – ناو سەیارەی خدر:

(( بە ڕاکواری دیمەنی – ١٣٠١ –ەوە، خدرو هەندرێن و هاوڕێ.. منداڵێک پێشی سەیارەکە کەوتووەو ڕێنماییان ئەکا بۆ ماڵی ئەردەڵان.. جادەی گڵەو داروبەردی زۆرە.. ماڵەکەی کە مناڵەکە نیشانیان ئەدا ئاساییە))

خدر: پیاو هەر شارەزای وەک تۆی لەگەڵا بێ باشە.

هاوڕێ: بڵێم چی کاک حەمەخدر گیان؟ گەڕەکەکەیان زۆر گۆڕاوە، ئێستاش باوەڕ ناکەم ئەوە بێ کە ئەو مناڵە ئەیڵێ.. بەخوا ئەوەندە هەوراز نەبوو.

خدر: ئادەی دابەزە بزانە ئەوەیە؟

(( هاوڕێ دائەبەزێت و لە دەرگا ئەدا، پیاو یان ژنێک دەرگا ئەکاتەوەو پێی ئەڵێن کە ئەوە نییەو دێتە دەرەوە، ئاماژەی بۆ ئەکا کە بگەڕێنەوەو بچنەوە سەری فەرعەکەو بچنە دوو کۆڵانی خوارتر.. هاوڕێ سەر ئەکەوێتەوە ))

هاوڕێ: کورە بابە خۆم وتم ئەوەنە هەوراز نەبوو، دوو کۆڵانی خوارترە، لێرەوە بگەڕێوە کاک حەمە خدر گیان.

هەندرێن: ئا ئا هەر جووتیکە بەو ماڵەوەو بە بەگێک دەرئەچی.

(( خەریکی پێچکردنەوەن و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٣٠٥ – ڕ/د – دەشت و دەر:

(( گوڵزارو ڕەوەزو زاهید لە دیمەنەکەدان))

ڕەوەز(( ئاماژەی ملەیەک ئەکا)): لەو ملەیەوە دێنە خوارەوە.. ئەبێ ئێمە (( ئاماژەی بەرزاییەک ئەکا)) لەو بەرزاییەوە بۆیان دانیشین.. بۆ نیشان تاقیکردنەوەش با گوڵە یەکەمجار تەقەیان لێ بکات، بزانین ئەیانپێکێ؟ فێرم کردووی چۆن چەکەکەت توند ئەگریت و کۆنترۆڵی ئەکا.. بە قەرەوڵەکەت نیشانەکە دیاریکەو هەردووکیان بپێکە.. خۆم چاودێریت ئەکەم، ناهێڵم دەست بکەنەوە.

گوڵزار: خەمت نەبێ، بە یەک فیشەک هەردووکیان ئەبرم.

ڕەوەز: کچێ ئەمە ڕاستییە فشەو گاڵتەی تیانییە.. من ئەمەوێ بۆ لێقەومان فێری پیاو کوشتنیش بی.

گوڵزار: خەمت نەبێ تاقانەکەم.

ڕەوەز(( بۆ زاهید، بە بێزاریی و سووک)): بەخوا گاڵتەی پێ دێت!

زاهید: نیو کیلۆیەک ئەبێ؟

ڕەوەز: ڕێک نیو کیلۆیە بەسمانە.. خۆ دزیی ناکەین!(( پێکەنین)).. دەی هەستن وادەیان نزیک بۆتەوە، با لە سەنگەری خۆمانا دامەزرێین.

گوڵزار(( بە خۆشحاڵییەوە)): یەڵڵا داااای.

ڕەوەز(( پاش کەمێک.. بۆ گوڵزار)): ئاگاداری خۆت بە شێت و وێت!

(( ئەچنە بەرزاییەکەو شوێنی خۆیان ئەگرن.. گوڵزار بە پاڵکەوتنانەوە نیشانەی ڕێگەکە ئەگرێتەوە))

# (( ئەڵقەی شەست و سێ))

زاهید: ئەڵێی شەڕکەری سەدساڵەیە هههە.

گوڵزار: لە فلیمەوە فێر بووم.

Cut

دیمەنی – ١٣٠٦ – ڕ/ن – قاوەخانە:

(( ڕەمزی و شەنیا دێنە قاوەخانەکەوەو دائەنیشن))

ڕەمزی: چاکم نەکرد لەو تەنیاییە ڕزگارم کردی؟

شەنیا: لێرەش هەر تەنیام.. وا ئەزانم ئەم شارە هیچ کەسێکی تیا ناژی.

ڕەمزی(( بە ڕابواردنەوە هەردوو دەستی بۆ دڵی ئەبا)): ئاااای عەشق دەردێکی چەند گرانی؟ هههه

شەنیا: وا مەکە مەکە، ئێستا وا ئەزانن عاشقمی؟!

ڕەمزی: خۆمان حسابین.. ئەوان چۆنی تێ ئەگەن، با تێبگەن.

شەنیا: نا وانییە، لەگەڵ ساماڵ زوو زوو ئەهاتینە ئێرە، با نەڵێن هەر ڕۆژەی لەگەڵ کەسێکایە.

ڕەمزی: باشە قوربان ئەوە ئەوەم نەکرد.. ئەی ئەما (( کەمێک دەستی ئەجوڵێنێ و شەنیا دەستی ئەگرێ))

شەنیا: نا توخوا هیچ مەکە، خۆم کەم بێتاقەت نیم!.. تۆ ئیشەکەتم پێ بڵێ و با بگەڕێینەوە.. بەخوا هیچ خوڵقم نییە.

ڕەمزی: چایەک، قاوەیەک نەخۆینەوە؟

شەنیا: تۆ قسە بکە، خۆیان دێن.

ڕەمزی: نارەوەنم ئەوێ؟

شەنیا: چۆن ویستنێک؟

ڕەمزی: یان سەری؟ یان بیهێنیتە گروپەوە.

شەنیا: بۆچی زۆر موشتاقی ئەوی؟

ڕەمزی: زۆر ڕەق و بێچاو و ڕووەو لە هیچیش ناسڵەمێتەوە.

شەنیا: ئەیناسم.. زۆرزان و زمانلوس و هەڵخەڵەتێنەریشە.

ڕەمزی: چیم بۆ ئەکەی؟

شەنیا: تۆ پێم بڵێ چی پێ ئەکەی؟

ڕەمزی: بە بەزمەکەوە خەریکی ئەکەم، تا سەری ئەدەم بە فەتارەتێکا.

شەنیا: ئەها !! تێگەیشتم! قسەی بەرزو نزمی لەگەڵ کردووی؟

ڕەمزی: وتیشی گاڵتەم کرد.. بەڵام خۆت کاکە ڕەمزیت ئەناسی.. با سەرەتا خۆی و خدر شتێکمان بۆ پەیاکەن.. ئەوسا خۆی فت ئەکەین و خدریش ئەخەینە بەردەستی خۆت و خۆشەویستەکەت.

شەنیا: من خدر ناناسم.

ڕەمزی: ئەویان لەسەر کاکتە، پەیوەندیی بە تۆوە نییە جارێ، تا دواتر ئەیکەم بە خزمەتکارت.

شەنیا: خۆت ئەزانی ئێستا مێشکم ساف نییە.. یان ڕێگەیەکم بۆ دانێ.. یان پەلەم لێمەکە، با ئەوەی بۆی ئەچم بەدەستی بێنم نەک تێک بشکێم.

ڕەمزی: خۆت لە پەیوەندیی ژنان شارەزاتری.. ئەم هەفتەیەم بەدەستەوەیە.. سێ ڕۆژی بۆ بیرکردنەوەی تۆ.

شەنیا: زۆر نییەو کەمیش نییە، ئەی کەسانیتری گروپەکەم پێویست نابێ، کە ببم بە سەرکردەوە؟

ڕەمزی: ئەمشەو هەموویان پەت ئەکەمە بەرپێت.

شەنیا: زۆر سوپاس، زۆر مەزنیت.

Cut

دیمەنی – ١٣٠٧ – ڕ/ د – بەردەمی ماڵی ئەردەڵان – خانوویەکی بچوک:

(( خدرو هەندرێن لە سەیارەکەدان، هاوڕێش لە دەرگا ئەدات و پاش کەمێک ئەگەڕێتەوە.. بە ڕاکواری دیمەنی – ١٣٠١ – ەوە))

هاوڕێ: دیارە کەسی لێ نییە.. نایکاتەوە!

خدر: خۆت هەڵدە سەر دیوارەکەو بچۆرە ئەو دیوەوە، بزانە هیچ حاڵیی نابێ؟ نەک خوانەخواست شتێکی بەسەر هاتبێ.

هاوڕێ: بەسەرچاو.

هەندرێن(( دەرگای سەیارە ئەکاتەوە)): با منیش هاوکارییەکی بکەم.

خدر: بچۆ.

(( هاوڕێ بەسەر دیوارا سەرئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٣٠٨ – ڕ / د – بەردەمی ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە هاتۆتە بەردەرگاو چاو ئەگێڕێ.. تەماشایەکی سەعات ئەکا.. ئەچێ بەرەوە چایخانەکەو لە دوورەوە کارە ئەبینێ چا تێئەکا.. بانگی ئەکا ))

تریفە: کاک کاروان زەحمەت نەبێ!

کارە (( دەست لە پیاڵەکان هەڵئەگرێ )): فەرموو تریفەخان ئەمرکە!

تریفە: ئەرێ ئەوە بۆ وا زۆریان پێچوو؟ ئاگاداری هیچ نیت؟

کارە: نەوەڵا تریفەخان، ماڵەکەی وەک باسیان کرد، کەمێ دوورە.. بەس بەخوا هی ئەو هەموو پێچوونەش نییە.. خەمت نەبێ هەر هاتنەوە پێت ئەڵێم.. ئەی بۆ تەلەفونێکیان بۆ ناکەی؟

تریفە: وەڵا پێم جوان نییە، ئەوان زۆرن.. ئەگەر تۆ بیکەی سوپاست ئەکەم.

کارە: وەی بەسەرچاو.. ئەها ئەهـ

(( کارە مۆبایل دەرئەهێنێت و تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٣٠٩ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( سەلوا خەوتووەو لە شوێنێکداو ڕێژوان بەدیار باوکیەوە خەوە نوچکەیەتی.. پاش کەمێک بروسک دێت و پاش سڵاو))

بروسک: هەستە کاکە بچۆ لە شوێنێکا سەرخەوێ بشکێنە، من بە دیارییەوە ئەبم.

ڕێژوان: زۆر سوپاس نەوەڵا سەعاتێکیتر سەلوا هەڵئەسێنم، بە نۆرە بەدیارییەوە ئەبین.

بروسک: بابە تۆ خەوە نوچکەتە هاکا خەوت لێکەوت و کەوتی.. نانەکەم بۆ هێناون.. نانەکەت بخۆو ئەم سەعاتە تۆش بخەوە، من سەلوا هەڵئەسێنم خەمت نەبێ.

ڕێژوان: ئەی ئیشت نییە؟

بروسک: نا ئیش تەواو.. دوای ئێرە ئەچمەوەماڵەوە.

ڕێژوان(( بزە)): وەڵا خێرت گەیی هاتی.. برسیم نییە، بەڵام وا کوێر ئەبم بۆ خەو، هەردوو چاوم ئەکزێتەوە هههە.

بروسک: دە بخەوە بەساقە، بێخەمبە.

(( ڕێژوان لەسەر ئەرزەکە بەتانیەک ڕائەخاو یەکیتر ئەدا بە خۆیا))

Cut

دیمەنی – ١٣١٠ – ڕ/ د – بەرماڵی ئەردەڵان:

(( خدر لەناو سەیارەکەداو هەندرێن لەبەردەرگا.. پاش کەمێک هاوڕێ بە هەڵەداوان ڕائەکات بەرەو خدر دێت.. هەرسێکیان بە جلوبەرگی دیمەنی – ١٣٠١ – ەوە))

هاوڕێ: مردووە! مردووە کاک حەمەخدر.

(( هەندرێن ڕائەکا بۆ ژوورەوەو خدریش بە پەلە دائەبەزێت و بەرەو ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣١١ – ڕ/د – ڕێگای دەرەوە – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕەوەزو زاهیدو گوڵزار))

ڕەوەز: ئیتر ئاوایە، تا ئەکوژرێی بۆ خۆت هەر بکوژە.

گوڵزار: جا من بۆ وا بکەم بکوژرێم؟.. هەر کەسێکم کوشت وەک ئەو دووەی ئەمڕۆ ناهێڵم کەس پێم بزانێ.. توخوا بەڕاست باش بووم؟

ڕەوەز: ئافەرین دەستخۆش زۆریش باش بووی، بە مۆبایلەکەشم گرتەیەکی ڤیدیۆییم گرتووی.. یەک جوان دەرچوی لەسەردەم خۆت داوە بە ئەرزاو تەقە ئەکەی، هەر مەپرسە.

گوڵزار: ئادەی توخوا با ببینم.!

ڕەوەز: کاتی نییە، کاتێ پێت نیشان ئەدەمەوە بڵێی جا ئەوە چییە؟

گوڵزار: دەدەی تاقانە! یەکەمجارمە با خۆم ببینم.

ڕەوەز(( مۆبایلەکەی دەرئەکات و ئەیخاتە سەر گرتەکە)): ئەوەتای، ئەو ژنە قارەمانە ببینە.

گوڵزار(( مۆبایلەکە وەرئەگرێت و هەر بە بینین زەنگ دێت)): جا ئەهێڵن ببینین؟

ڕەوەز(( لێیوەرئەگرێ)): ها چیت ئەوێ؟......... چۆن؟؟؟؟؟ ........... کەی زانیت؟ ........... ئۆووووو ناڵێن بەچی؟ ............... دەی چاوی دەرئەهات گوڵە خۆش بێ هههەه. (( مۆبایل دائەخاتەوەو ئەیداتەوە گوڵزار)) کەپڵە نازدارەکەشت خۆت خۆش.

گوڵزار: جا من کەپڵم لە کوێ بوو؟ هەر گاڵتەشم بە کەپڵ کەپڵێنە نایەت هەهە؟ کێ مردووە؟

ڕەوەز: ئەردەڵان گیان.

زاهید: ئەک خوا قەت عافوی نەکا! هەزار جار هههەه.

گوڵزار: وەیس کە گوناخ بوو!!

(( پێکەنین))

ڕەوەز: هار ببوو بۆ گوڵە.

زاهید: گوڵەش کەم هاری نەئەکرد، شتی وای ئەکرد، نەک ئەو کەس خۆی بۆ نەئەگیرا.

گوڵزار: ئەی چۆن بەعولبان؟ ئەبێ لێی بزانی خۆ گاڵتە نییە.

ڕەوەز: کورە تازە گوڵێ لەدەست دەرچوو، بوو بە پیاوکوژیش هههە.

گوڵزار: واو چەند جوان نیشانەم لێگرتوونەتەوە؟! واو.. واو

Cut

دیمەنی – ١٣١٢ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

ئاری: بەڵێ گەورەم، وەک دیارە پێشتر زەبری بەرکەوتووە.

بەهێز: ئاسەواری لێدان بەجەستەیەوە دیارە، پێش چوار ڕۆژە.. بەڵێ ئەو خوێن لەبەرڕۆشتنە کەمەش دەمارەکەی سەریشی هەر دەرەنجامی ئەو لێدانەیە.. بەپێی ڕاپۆرتەکەی پزیشکی دادوەریی.

ئاری: بەڵێ گەورەم.. ئێمە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی دادوەری لێکۆلینەوە، دەست پێئەکەین و بەدواداچوونی تەواوی بۆ ئەکەین.. لە نزیکەکانی ئەپرسینەوە بگەینە ئەنجامێک.

بەهێز: دوای فەرمانی دادوەر کڕیاری کارگەکەی ڕاماڵیش بانگکەن کە لەو سەرچڵەی هاوڕێی کڕیوەتەوە.. ئەم هەموو کڕین و فرۆشتنە بێ مەرام نییە.

ئاری: بەڵێ گەورەم، ئێستا شەنیا ناوێک کڕیویەتییەوە، باوکی لە زیندانایە.

بەهێز: بانگیکەن، ئاشنایەتی نێوان خۆی و سەرچڵ و ڕاماڵ گەر هەیبێ وەریگرین.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٣١٣ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان جلی مۆدێلی نوێی لەبەر کردووەو نیشانی هەندرێنی ئەدا ))

هەندرێن: یاخوا پیرۆزت بێ زۆر جوانن.. بەڵام وا دیارە زۆر گرانیش بن.

تافان: ئەی خۆ ئەو سەرسوڵکەرانە، هەر حسابی کێچێکیشیان بۆ نەئەکردم، منیش هەرچیم هەبوو و نەبوو، چووم ئەمانەم پێکڕی، بزانە بەیانی چۆن شەق ئەبەن؟!

هەندرێن: مەبەستت لە سەرسواڵکەرەکە ئاوایە یان ژنەکەی؟

تافان: کورە هەموویان.. ئەڵێی کەس پارەی نەبینیوە ئەوان نەبێت.

هەندرێن: ئەوە باسی سەرسواڵکەرت کرد، بیللاهی شێوەی ئەو ئەردەڵانە داماوەم لەبەرچاو لاناچێ.. داماوە تازە دەستی ئەهێنا بە خۆیاو شتێ پارەی دەرخستبوو کە هەیەتی، کەچی کە بینیمان بە مردوویی، هەر شڕو شیتاڵە کۆنەکانی لەبەرا بوو، زۆر گوناح بوو.

تافان: مەبەستت منە تازە پارە دەرئەخەم وانا؟

هەندرێن: کچێ بۆ ئەیهێنیتە سەر خۆت، من باسی ئەو حەماڵە داماوە ئەکەم.. باوەڕ ئەکەی هەر ئەو قاتەی هەبوو کە بۆ دەرەوە لەبەری ئەکرد؟ بە بزمارێکا هەڵواسرابوو.

تافان: دەی ئەگەر مەبەستت من بێ یان نەبێ! خۆ مەسەلەی کەوا نان بخۆت بیستووە.. دڵنیابە ئیتر جارێکیتر من بەو سیپاڵە کۆنەوە نابینیتەوە.

هەندرێن: دەی هەندێ جلی ناو ماڵیش بکڕە، با ناوماڵەکەشت کەوا نان بخۆ بێ.

تافان(( لچ هەڵئەقورتێنێ )): جا بۆ کێی لەبەرکەم؟ پیف!

هەندرێن: بۆ پیف ژنەکە، بۆ منی لەبەرکە، ئەی خۆ بە نیاز نیت تازە بە تازە بۆ خەڵکی لەبەرکەی؟

تافان: پارەم بدەرێ و با بیکڕم و بۆت لەبەرکەم. ________ Cut ___________

دیمەنی – ١٣١٤ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و ڕەوەزو سەرچڵ))

ڕەمزی(( بێ حەوسەڵە)): لە گۆڕی بابی سەرۆکیش باشە؟ ئاخر ئەوە سەرۆکمان بوو، بۆیە هەر ماوەی جارێک کۆمەڵێکمان ئەکرێن بە پەتەوە.

ڕەوەز: ئەشهەدوو من قەت بەوەم نەزانیوە هیچ توانایەکی هەبێ، تا کاک دارەوان بوو، هەر ئەو و دواتریش هەر خۆتی.

ڕەمزی: کاکە بەم کابرا ترسنۆکە بێ لە ساڵێکا ئیشێ بکرێ.. تەبعەن با یەک شتت پێ بڵێم، بۆ ئەو دووەی ئەڵێی گوڵزار کوشتنی، پێموت کاکە ئەوە خێرێکەو هەر لە ئاسمانەوە باریوە، ئیشەکە بە پێنج دەقە ئەکرێ.. کەچی ناجسنە، ئەیوت چاومەبڕنە ماڵی خەڵک، بچن لێی بکڕنەوەو بیفرۆشنەوە خێرەکەی باشە.. ئێ کە من بە خۆڕایی دەستم بکەوێ بۆ بیکڕمەوە؟

سەرچڵ: خۆت ببە بە سەرۆک و بە پاڵێک فرێیدەنە دەرەوە، چار نییە.

ڕەمزی: بابە ئەو کابرایە هەر حەزی بە خۆدەرخستنە.. تێی هەڵئەدەین و کەسیش نە سەرۆکەو نەبەرۆک.. هەموو پێکەوە ئیش ئەکەین و من هەر ئیشەکانتان پێ ئەڵێم چی بکەن و چی نەکەن و تەواو.

سەرچڵ: دەستخۆش.

ڕەوەز: منیش لەگەڵ ئەوەدام. بە کەڵکی ئێمە نایەت.

ڕەمزی: من شتێکی گەورەم بەدەستەوەیەو بەوە سنوری وڵاتانیش ئەبەزێنین.. ئەوە ماوەیەکە بەشێکیم بەو سپاردبوو زوو جێبەجێی بکا، کەچی هاتۆتەوە ئەڵێ دوو مانگم پێ ئەچێ.. هەهە من بەو دوو مانگە دوو بڕی گەورە ئەگەیەنمە ئێرەو بۆ دەریشەوەی ڕەوانە ئەکەمەوە هەهە دووووووووو مااااانگ!

سەرچڵ: ئەو هەتیوەش مرد کە لەگەڵم هات بۆ کوشتنی ڕاماڵەکە.

ڕەمزی(( بە کزیی و سارد )): ئەزانم ڕەوەز پێی وتم.. کاکە ئەوەندە خراپیش لەوانەی خۆمان مەدەن، ئەوەتا ئاوایان بەسەر دێ.

ڕەوەز: لەسەر لاساریی خۆی بوو، خۆ ئەبێ تەمێیکەم.

ڕەمزی: هەر هەڕەشە بەس بوو، دەماغسزی وا شەق و کێبڵی بۆ چی بوو؟

ڕەوەز: دەی تازە مرد، زۆر لەسەری نەڕۆین باشترە.

ڕەمزی: مەبەستم ئەوانیترە، ئاگاتان لێیان بێ. نەفەرمان زۆر پێویستە.. (( بۆ سەرچڵ )) ئەوە کچە لە چاودێرییەکەی بەردەوامە؟

سەرچڵ: بەڵێ.

ڕەمزی: سەرچڵ بیستووتە گوڵزار چەند ئازایانە پیاوی کوشتووە؟ ئەبێ ئەویشم بۆ وا لێ بکەی.. ئەوی خۆشم بڕیار بوو بێت، کەچی وا دیار نییە.

Cut

ديمەنی – ١٣١٥ – ش/ ن – ماڵی شەنیا:

(( شەنیا بە جلی دەرەوە تێل ئەکا))

شەنیا: ١- ئەی چۆن بیرت ناکەم، وا نزیکی هەفتەیەکە.. ٢- خاو بۆتەوە، خۆم باش ئەزانم، بەڵام ساماڵ ئەزانی ئەوەی بیرم لێ نەئەکردەوە ئەوە بوو دڵنیای هاوڕێم لەم گروپەدا بێ؟.. تا ئێستا هیچ هەستێکیشم پێ نەکردبوو.. باوەڕکە ئەمڕۆ خۆم بە گێژوحوڵ ئەهاتە بەرچاو، کە ئەوەندە ساویلکە بووم لەگەڵیا ........... ٣- (( بە خاویی)) قسەم کرررد قسەم کرد.. ئەزانی تۆش لەوە ئەچی گروپێکیترت هەبێ.. ئەو هەموو پلان و بەرنامەیەت چۆن بە مێشکا دێ ئەی هاوار!! ............ ٤- شەنیا: هەموو شتێکمان بۆ دەرئەکەوێ دڵنیابە، بۆ نا؟ وا جارێ کارگەکەی ڕەحمەتییەیان بەسەر منا ساغکردەوە بە پارەیەکی ڕەمزیی، زۆر نەبوو.. بەڵام لە بەڵێننامەکە کە ئیمزا کرا، پارەیەکیتر قەبە نوسرابوو ........ ٥- بەڵێ نوسرابوو هەمووی بە کاش دراوە.. من ئیشم بەو کارگەیە نییە مەگەر خۆیان ئیشیان پێی بێ.. پێشنیازی ڕەمزی بوو ............ ٦- چۆن؟ ................ ٧- باشە، کەواتە با زوو بنووم بۆ ئەوەی بەیانی زوو بێت هاهاها ............٨- من قوربانت و بەساقەشت بم....... ٩- بێخەمبە ساماڵ گیان،کەمێک شارەزایانم.. دە تۆش بنوو با بەیانی بۆ تۆش زوو بێت.......... ١٠- شەوشاد ئازیزم. (( مۆبایلەکە ماچ ئەکا))

(( هەڵئەسێ و ئەڕوا))

Cut

ديمەنی – ١٣١٦ – ش/ ن – ژوورێک:

(( ساماڵ تێل ئەکا))

ساماڵ: ١- منیش زۆرت بیرئەکەم، هەر زۆر زۆریش.. بەڵام ئەبێ ئاگاداری ئەو هەموو چاوەش بین بەدوامانەوە.......... ٢- ئاساییە بەساقەوبم، مەسەلە گێلیی تۆ نییە.. دیارە کاری ئەوان پشت بەستنە بە دۆستە نزیکەکانی یەکتر، ڕەنگە دواتر من بۆ تۆش دابنێن، یان تۆ بکەنە چاودێری من.. هەر گوێشی مەدەرێ، لەگەڵ سەرخێڵا قسەت کرد بۆ هاتنەکەت؟ .......... ٣- پێداویستیی ئیشکردنە لەگەڵ ئەمجۆرە کەسانەیا .. بیرت نەچێ، ئەوان چۆنن ئەبێ لەوان وریاتر بین.. شەنیا تۆ لەو بڕوایەدای ئەم ڕەمزییە ڕاماڵی برای کوشتبم؟ من خەریکە گومانی لێ بکەم............... ٤- دڵنیا بوویتەوە لە بەڵێننامەکەدا نوسرابێ تەواوی پارەکە وەرگیراوە........ ٥- ئمممم شتێک حاڵی بووم.. گومانەکەم لە ڕەمزی زۆر زیاترە ئێستا.......... ٦- سبەی کە یەکمان بینی تێت ئەگەیەنم.......... ٧- چەند جوانە ئاوا منالانە قسە ئەکەی، قوربانت ......... ٨- سوپاس خوا نەکا.. ئاگات لە خۆت بێ، ئەبێ سبەینێ لە هەموو ژیانت وریاتر بیت.. تکایە بزانە چاو لەکەس ناپۆشن........ ٩- باشە گیان، هەر ئێستا ئەنووم، چاوەڕوانتم سبەی.. تۆ کاتت خۆش و شەوت شاد بێ.. خوات لەگەڵ.

(( مۆبایلەکە ماچ ئەکات و ئەخەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٣١٧ – ش/ د – بەر ماڵی شەنیا:

Mute

(( شەنیا بە ڕاکواری دیمەنی – ١٣١٥ – دێتە دەرەوەو ئەچێتە سەیارەکەیەوە.. سەیارەیەک لە دوورەوە چاودێریی ئەکا، سەرخێڵی تیایە.. شەنیا دەرئەچێت و ئەویش دوای ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٣١٨ – مربوط – ش/ د – ناو سەیارەی سەرخێڵ:

(( سەرخێڵ تێل ئەکا ))

سەرخێڵ: ئۆکەی پەیوەندیمان ئەبێت.. بۆ هەر شوێنێک چوو ئاگادارت ئەکەمەوە.. جارێ بای.

(( بەردەوام ئەبێت لە شوێن کەوتنی شەنیا تا ئەگاتە ماڵی ڕەمزی، شەنیا دائەبەزێت و ئەچێتە ژوورەوە.. ئەکرێت بە دوو دیمەن وەربگیرێت ))

سەرخێڵ(( ژمارە لێ ئەدات و وەریئەگرێ )): لەبەر ماڵێکا وەستاوە، یەک دوو سەیارەیتریشی لێیە.

ساماڵ(( دەنگ )): ماڵەکە جوان دیاریکە، بزانین ماڵی کێیە؟

سەرخێڵ: لێم تێک ناچێ، دڵنیابە.

ساماڵ: دەستخۆش.

Cut

دیمەنی – ١٣١٩ – ش/ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان بانگی پاسەوان ئەکا، زاهید بە دەمامکەوە دێت))

زاهید: بهێڵە بخەوم.. ئەمڕۆ لە ڕاو بووم.

دیدەوان: بە ڕۆژ؟

زاهید: ئۆو ئەگەر ئەتبینی؟ چۆن تەپاوتل لە ملەکەوە پێکران و گلۆر بوونەوە؟!!!! ئای خوایە چەند خۆش بوو.

دیدەوان: دیارە نیشانەشکێنیشی.

زاهید: کورە من نا، کچێکی سەر بەخۆمان دووانی کوشت.

دیدەوان: کەڵەکێوی؟ یا وردە؟

زاهید: کورە تلیاکچی بێ ئەقڵ تلیاکچی.. نیو کیلۆیان پێ بوو، ئەو کچە بەرودوا هەردووکیان غلکردەوە بۆ خوارەوە.

(( دیدەوان، بیرکردنەوەیەکی خێراو ڕاچڵەکین))

**بۆ فلاشباک:**

دیمەنی – ١٣٢٠ – ڕ/ د- پارکێک:

(( دیدەوان دانیشتووەو ڕەوەز بە پەلە ئەگاتە لای))

دیدەوان: ها خێر؟

ڕەوەز: هەواڵم پێگەیشتووە، دووکەس بە پێ دێنەوە بۆ ناوشارو نیوکیلۆیان پێیە.. بابچم ڕێیان پێ بگرم.

دیدەوان: لێیان ئەکڕیتەوە؟

ڕەوەز: جا لێیان بکڕمەوە بۆ بگەمە بنی دنیا، ئەیانکوژم و شتەکەش ئەهێنمەوە.

دیدەوان: نا ڕۆڵە، چاو مەبڕە ماڵی خەڵکیی، لێیان بکڕەوە، خێری زۆرە، بەس ئاوا ناخۆشە.

ڕەوەز: دەی خۆ هەموو هەر چاومان لە ماڵی خەڵکە سەرۆک گیان.

دیدەوان: کاتی قسەمان نییە، نەک یەکێ لە پیاوەکانی ڕەمزی بمانبینێ و بە جۆرێکیتری تێبگا.

**فلاشباک تەواو:**

Cut

دیمەنی – ١٣٢١ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣١٩ – ژووری سجنی دیدەوان:

زاهید: ئەوە چی بوو کارەبا گرتتی؟

دیدەوان(( هێمن ئەبێتەوەو خەندەیەک)): تۆش لەگەڵ ڕەوەزای؟

زاهید(( شڵەژان)): ڕەوەز کێیە نایناسم.

دیدەوان: ئەمە ڕەمزی پێی کردن؟

زاهید(( ئەیەوێ بڕوا)): ڕەمزی چی؟ تۆ باسی چی ئەکەی؟ من ئەو کەسانە ناناسم.

دیدەوان: وەرە مەڕۆ، با دوو قسەی تەواوت بۆ بکەم، کە تا ماوی بە دەسکەوتی بزانی.

زاهید: قسەی تۆم ناوێ.

دیدەوان: پەشیمان ئەبیتەوە کوڕم، من وەکو باوکت وام زیانت پێ ناگەیەنم.

Cut

دیمەنی – ١٣٢٢ – ڕ/ ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری ئامۆ:

(( ئامۆو دکتۆرێک))

ئامۆ: ئەی هیچ چارەسەرێک، لێرە لە دەرەوەی وڵات نییە دکتۆر گیان؟

دکتۆر: کاک ئامۆ، بڕوا بکە هەر شتێکم شک ببردایە پێم ئەوتی.. ئەم زەبرەکە بەر بەشێکی دڕکەپەتکی کەوتووە، تازە تەواوی ژیانی بەو نیوە ئیفلیجییەوە بەڕێ ئەکاو بە هیچ شتێک لای ڕاستی، لە ملی بەرەوخوار، ناگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.. ئەمە ڕاستییەکەیە بەداخەوە.

ئامۆ: زۆر بەداخەوە بۆ کاک زوبێر.. بەڕاستیی شایانی ئەوە نەبوو.. پۆلیسیش هەندێ پرسیاریان لێی هەیە.. کەی ئەتوانێ باش قسە بکا؟

دکتۆر: وەک وتم، هیچ کێشەی سەرو مێشکی نییە..بەڵام لێیگەڕێن با چەند ڕۆژێک پشوو بدا.. ئەگەرنا، ئێستا ئەتوانێ قسەی ئاسایی بکا.

ئامۆ: ئەکرێ خۆی ئەوە بزانێ؟

دکتۆر: ئەی ئەمڕۆش نەبێ سبەی هەر تێئەگا.

ئامۆ: کەواتە بە یەکجاریی لە ژیانیش دابڕا؟

دکتۆر: ئەکرێ لەسەر عەرەبانەی تایبەت بجوڵێ لەناو ماڵا.. لەبەر ئەوەی مێشکیشی سەلامەتە.. خۆی و دەوروبەرەکەشی بەوە ڕادێن و بە باشیی ژیان ئەکا.

ئامۆ: کێشەی نانخواردن و ئیشی پێویستیی خۆی و ئەو شتانەی نابێ.

دکتۆر: نا، ئەوتۆ نییە، بەڵام ئیتر ئەبێ ئاگاداریشی بن.. ئەوەی ئەودیو خێزانیەتی؟

ئامۆ: بەڵێ، ئەویش جارێ وێرانە.

دکتۆر: بەڵێ ڕاستە.. تا ئەو بە یەکجاریی هەڵئەسێتەوە سەر پێ.. ئەبێ بەردەوام یەکێیان بەدیارەوە بێ.. خۆشیان دواتر ئەزانن چی ئەکەن، بە وەزعەکە ڕادێن.

Cut

دیمەنی – ۱۳۲۳ –ڕ- لای ئێوارە/ د –گوندی ئەرەڵان:

((مەیتی ئەردەڵان لە پیکابێکی دەبڵدایە، سەیارەکەی خدرو سەیارەیەکی تری بەدواوەیە، خەڵکی ئاوایی هەموو بە ڕیز وەستاون و مەیتەکە بە ناویانا ئەڕواو دەستی بۆ بەرز ئەکەنەوە، تا ئەگاتە بەر مزگەوت و هەندێک پیاو سوپاسی خدر ئەکەن و مەیت ئەبەنە مزگەوتەکەوە، خدریش لە ناویانا ئەمێنێتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣٢٤ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە:

(( شەنیاو نارەوەن ))

شەنیا: بەمجارەوە سێ جارە من دێمە خزمەتت.. باوەڕ بکە تەنها پەیام ئەگەیەنم و هیچیتر.

نارەوەن: ئەی کاک ڕەمزی خۆی بۆ نایا؟

شەنیا: ڕاستییەکەی ئیشی کاک ڕەمزی نییە بێتە ئەم وردەکاریانەوە، ئەو تەنها جۆری ئیشەکان و ڕێکخستنەکەی لەسەرە.. ئیتر ئەبێ ئێمە ئیشەکانیتر بکەین.. جەنابیشت لەگەڵ ئەو کاک دیدەوانە هەموو شتێکتان بڕاندبۆوە.. مەبەستم ئامادەییت نیشانداوە بۆ ئیشکردن؟

نارەوەن: من وامزانی دیدەوان بە تەنهایە، چوزانم ئەم هەمووەی بە دواوەیە؟.. ئەبێ تێم بگەی شەنیا گیان.. ئێستاش هەر ئەوە ئەڵێمەوە، پێویستیم بە بیرکردنەوەیە.

شەنیا: کاتی نیوەڕۆیەو منیش ئەبێ وەڵامێکم پێ بێ نارەوەن خان، ئەوەمان لێ قبوڵ ناکەن و بە دەسی دەسیی ئەزانن.. دوای نیوەڕۆش نامپەرژێ، ماڵی خاڵێکم دەمێکە کوڕێکی سەیارە لێیداوە، ئەبێ بچم سەرێکیان بدەم، ئەگینا ئەهاتمەوە خزمەتت (( هەڵئەسێ )) هەستە با بچین لەسەر نانەکە قسەوباسمان تەواوکەین.

نارەوەن: بەڵام من هەر ئەبێ ڕای خدر بزانم و بشزانم بۆ خۆم دەست ئەدا یان نا؟

شەنیا: لەوێ قسەمان تەواو ئەکەین، جارێ فەرمووو!

(( هەستان و چوونە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٣٢٥ – ڕ/ د – سەر کورسیی پارکێک:

(( ڕێبوارو تافان جل و بەرگی گۆڕاوە، تازەکان))

تافان: نا نا زۆر لەوە هیچ و پووچترن بیریان لێ ئەکەیتەوە.. بۆ چەند ڕۆژە؟

ڕێبوار: هەفتە ئەبێ.

تافان: ئیتر پێنج شەش ڕۆژە هەفتەیە هەر چەنێکە، من هەر سێ قاتەکەم لەبەر کردووە، باوەڕ ئەکەی کوێراییان داهاتووە یەکێکیان هەر ناشڵێن پیرۆزە یا شتێک.

ڕێبوار: بەڕاست ئاوا ئەوەی بە مێردەکەت وتووە؟

تافان: بە چاوی تۆ هیچم پێوە نەناوە، ڕێک پێیوتبوو کاک هەندرێن، ئێمە ژنەکەی تۆمان بۆ هاوکاریی بژێویی وەرگرت.. تا ئێستا موچەیەکی وەرنەگرتووەو جلەکانیشی بایی شەش موچەی ئەبێ.. وتبووی کەواتە ئێوە پێویستیتان بە هاوکاری نییە.. ئێ ئەمە یەعنی چی؟ ها؟

ڕێبوار(( سست)): ئەوە یەعنی تۆ لای ئەوان جێت نابێتەوەو ئەو خدرە شتی درکاندووە.

تافان: یاخوا هیچی نەوتبێ.. ئەگینا بە دەستی خۆم ئەیکوژم، چی ئەبێ با ببێ.

ڕێبوار: تۆ هەست بە هیچ ئەکەی لە چاویانا؟

تافان: لەوبارەیەوە هەستم بە هیچ نەکردووە.. ئەوەندە ئەزانم سڵاوەکەش بە لالووتەوە ئەکەن.. بەوەیا ئەڵێم ڕەنگە شتێک وترابێ.

ڕێبوار: بە قسەم بکە تا زووە، بە هەندرێنی مێردت بڵێ، ئیتر ناچمەوە بۆ کۆمپانیا.

تافان: ئەی پێم ناڵێ، ئەو هات و هاوارەت بۆ کرد تا وەریانگرتی؟

ڕێبوار: خۆت زیرەکی، شتێک بدۆزەرەوە.

تافان: ڕێبوار گیان ئەبێ شتێکی وا بێ، قەناعەت بکا.. بە داماوی تێ مەگە.. زۆر وریایە، درک بە هەموو شتێک ئەکا، زۆڵی وا کەمە.

ڕێبوار: ئێ بڵێ، هەر لەسەر ئەو قسەیەی ئاوا بە تۆی وتووە، هەرچەند ئەیانبینم ئەوەم بیر ئەکەوێتەوەو کەیفم پێیان نایەت.

تافان: لەو بڕوایەیای ئەوە باش بێ؟

ڕێبوار: هەر ئەوەت بەدەستەوەیە.

تافان: باشە بۆ ئەبێ زوو دەست لەکار بکێشمەوە؟

ڕێبوار: تافان گیان ئەو قسەیە خۆی مانای دەرکردنە.. جا پێش ئەوەی بڵێ فەرموو بۆماڵەوە، خۆت دەست پێشکەریی بکە.

تافان: ئەی چۆنە کە هەندرێن ڕازیی بوو، بەیانی بچم و بڵێم، هەرچییەکم کەوتۆتەلاتان بمدەنێ و من نایەمەوە؟

ڕێبوار: ئەوەش باشە، با وابزانن موحتاجی.

تافان: ئەی دوایی چ ئیشێکم بۆ ئەدۆزیتەوە تۆ ببینم؟

ڕێبوار: جارێ ئەمەوێ بزانم برادەرەکانم هیچم بۆ بە هیچ ناکەن لەگەڵ ئەو خدرەیا؟ ئەوسا یەکتر بینین کێشە نابێ.. هەر کاتێ ویستمان مۆبایل هەیە.. بزانم چ ئیشێکیتریشت بۆ دائەنێن.

تافان: هەر ئەو خدرەتان بتۆپاندایە، هیچیترم نەئەویست.

Cut

دیمەنی - ١٣٢٦ - ڕ/ن - چێشتخانەیەک:

(( شەنیاو نارەوەن))

شەنیا: منیش و تۆو خواش ئەزانین، کە ئامۆ چەند شیرینە لە دڵماو تا مردنیش شوو بە هەرکەسێ بکەم، ئامۆم لەلا ناسڕێتەوە.. ئەم نهێنییەم پێوتی و دڵنیام لە پاراستنی.

نارەوەن: چاوەکەم زۆر بێخەمبە، مەگەر گڵ لێم ببیستێ.

شەنیا: جا بەو خۆشەویستییە پاکەمەوە تکات لێ ئەکەم لەم خەڵکەو بە تایبەت ڕەمزی دووربکەوەرەوە، نیازیان لەگەڵتا هەر زۆر خراپە نارەوەن خان، بڕوا بکە کە دایکی ئامۆی، موحیبەتت بەقەدەر دایکی خۆم لە دڵمایە.

نارەوەن: سوپاس شەنیا گیان، تێت ئەگەم باوانم.. ئەزانم ئامۆ بۆ تۆ چییە.. کاشکای هەستی ئەو بە قسەی من کاری تێ بکرایە، باوەڕ بکە شل و کوت بووم تیایا، بێسوود بوو.

شەنیا: نارەوەن خان، دوای ئەوەی ئامۆ منی لەبەرچاوکەوت.. سوێندم خوارد هەر کەسێک بووە باعیسی ئەوەی ئامۆی لێکردم، تۆڵەی لێبکەمەوە.. من زۆر گەڕام تا ئەو کەسە بدۆزمەوە کە باوکمی بۆ ئەو کارە هانداو منی بەو دەردەبرد.. ئەگەر من و ئامۆ لە کات و شوێنێکیتر یەکترمان بناسیایە، هەرگیز جیا نەئەبووینەوەو ئەو دڵی لە من ڕەش نەئەبوو.

نارەوەن: دۆزیتەوە کێ بوو؟

شەنیا: بەڵێ زاواکەت و لەسەروو هەمووشیانەوە ئەم ڕەمزییەناموبارەکە بوو.

نارەوەن: ئەک خوا بیانگرێ.

شەنیا: ئێستا ئەو منی ناردووە کە تۆ بخەمە گروپەکەوە.. پێموتی ئاگاداری خۆت بە ژوورەکەت جیهازی تیایەو هەرچییەکی تیا بوترێ ئەوان ئەیبیستن.

نارەوەن: جا خۆی بە ئاشکرا وتی.

شەنیا: دەی کەواتە هەر هیچ نەبێ لەبەر منداڵەکانت ئەو شوێنە جێهێڵەو لەو یارییە نەگریس و چەپەڵەشیان دوورکەوەرەوە نارەوەن خان، باوەڕم پێ بکە تیا ئەچی.. ئیتر کەیفی خۆشتە.

نارەوەن: زۆر سوپاس شەنە گیانی من.. ئەم چاکەیەتم قەت لەبیر ناچێ.. بزانم وا ئەکەم شتێک بدۆزمەوەو دوور بکەومەوە.

شەنیا: هیچی ناوێ، ڕێک و باریک بڵێ، ئەچمەوە وەکالەتەکەی خۆم و ئەم ئیشە بە من ناکرێ.. تۆ چیت نەکراوەو چیت پێویستە بۆ خاتری خوا تا قاچت لەم قوڕەوە بئاڵێ؟

نارەوەن: ناوەڵا لە خواو سەری تۆ بەزیاد بێ پێویستیم بە هیچ نییە، قسەکەی تۆیە، تا زووە دوورکەومەوە باشترە.. بەڵێنت ئەدەمێ جارێکیتریش قسە لەگەڵ ئامۆ بکەمەوە.

شەنیا: تکایە نارەوەن خان گیان.. بۆ یەکجاریی ئەو باسە داخە، من لەبەرچاوی ڕەش بووم و هەڵەی منیش بوو، تازە ڕاست ناکرێتەوە.. تکا ئەکەم هیچ مەڵێ با دڵە پاکەکەت نەشکێنێ و دڵە بێگەردەکەی ئەویش جارێکیتر ئازار نەچێژێ.. ئەوەم لە تۆ ناوێ.

نارەوەن: ئەی چیت ئەوێ کچەکەم؟ هەرچییەکت لەم دنیایەیا ئەوێ بیڵێ و بیخەمە بەردەمت.

شەنیا: تەنها ئەوەندەم لێتان ئەوێ، خۆتان بپارێزن و بەشداریی هیچ شتێکی ئەم هەرچیی و پەرچییانە مەکەن، ئەمانە لە جۆری ئێوە نیین، زۆر پیس و دڕندەن.. تکا ئەکەم سەلامەت بژین، ڕەنگە ئەمە دواجاریش بێ یەکتر ببینین تیایا.

نارەوەن: جا من چۆن تازە پشتت تێئەکەم؟

Cut

دیمەنی – ١٣٢٧ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( زوبێر مل و دەستێک و پێی لە گەچ گیراوە.. باش قسە ئەکا.. لای ڕاستی شەلەلە.. ڕێژوان و چیمەن و سەلواو بروسک لەوێن))

چیمەن: ئەوە تۆ خەمی چیتە باوکە گیان؟ هەموو شتێک باش ئەڕوا، ئەوەش (( منالەکە)) زنە، ئەها گوێی لە دەنگت بوو، چۆن چاوت بۆ ئەگێڕێ؟

زوبێر(( بەدەم ماندویتیی و ئازارەوە)): قوربانی، بێچاوێنیی بێ چەند جوان بووە.. ئا بیهێنە با ماچێکی بکەم. (( چیمەن ڕوومەتی زنە ئەنێ بە دەمی باوکییەوە)) ئۆخەی!! نەمردم زنە گیان، ماچم کردیەوە.

بروسک: تۆ چۆن ئەمری مامە گیان؟.. تۆ بەهێزی، پۆلای پۆلا.. ئێمە هەموو چاومان لە خۆڕاگریی تۆ کردووە.. تکایە ڕێنماییمان بکە چۆن بەرگەی زەبرە قورسەکان بگرین.

زوبێر(( نقە نق)): کوڕم ئەگەر مرۆڤ بەدەست خۆی بووایە.. بەرگریی ئەکرد، بەرگەی کاریگەرترین زەبریشی ئەگرت.. ئەوە ئەمبینی، ئەوەی لە خەیالی کەسمانا نەبوو، لایەکم ئیفلیج بێ، ڕوویداو نەشمتوانی نەهێڵم ڕووبدا.. ئیتر ژیان ئاوایە ناتوانی پێشبینیی شتەکان بکەیت.

سەلوا: هەرچی ڕوویداوە مامە گیان لە خواوەیە، باش نییە کەسێک ئەوەی نەکردووە؟!

زوبێر: جا وا یەکێکیش کردبێتی ڕۆلە؟! تازە ڕوویداوە، خۆ شمشێری تۆڵەی لێهەڵناگرم، ئەو باوەڕە پووچەم فڕێدا.. ئێستا باوەڕەکەم وایە ئەبێ هەموو کەسێ باش بێ، ئەوانەی کەسێکیش ئەکوژن ئەبێ تێبگەیەنرێن چ هەڵەیەکی گەورەیان دەرهەق بە ژیانی کەسێک کردووە.. دڵنیا بە کە تێگەیشت ئاوات بە مردن ئەخوازێ، هەموو ساتێکی مردنێک ئەبێ.

ڕێژوان: جا خۆزگە بمدۆزیایەتەوە کێ ئەمەی کرد؟ ئەوسا ئەتبینی چیم پێ ئەکرد باوکە گیان، ببورە ئەوسا من شمشێری تۆڵەم لێ هەڵئەگرت.

زوبێر: ڕۆلە بە هەڵەیەکی باوکت ئەمەڕوویدا هەهە بۆ کێ ئەگەڕێی؟

بروسک: نا مامە، پۆلیس بە وردیی لێکۆڵینەوەی کردو دەرکەوت دەسکاریی سەیارەکەت کراوە، بۆ ئەوەی ئەمە ڕوویدا.

زوبێر(( ترس )): چۆن؟؟؟؟؟؟

ڕێژوان: ئەی چۆن باوە گیان، خوا ئەکا خۆمان یان پۆلیس بۆمان ئەدۆزرێتەوە؟؟؟؟

چیمەن: هەواڵەی خوایکەن ڕێژوان گیان، یاخوا هەرکەسێکە لە خوێنی خۆیا بگەوزێ.

سەلوا: ئامین.

زوبێر: باشە من دوژمنم کێیە ئەمەی لەگەڵ کردبم و چۆن منی دۆزییەوە لەو بنی دنیایە.. نا نا ناچێتە ئەقڵمەوە هیچ کەسێک ئەمەی کردبێ.. هەر کێشەی سەیارەکە خۆی بوو.. ئەوە ڕاست نییە.

Cut

دیمەنی – ١٣٢٨ – ڕ/د – بەر ماڵی ئاوا:

(( شەپۆل، کوڕێکی زۆر جوان، شیکی تەمەن نزیکەی ٣٥ ساڵ لە جەڕەسی ماڵی ئاوا ئەداو نینا دێت دەرگا ئەکاتەوە.. شەپۆل جاروبار هەندێک ئاماژە ئەکا وەک لەگەڵ خۆشەویستیا وەستابێ.. سەیارەیەک چەندجارێک بەوێدا تێپەڕ ئەبێ))

شەپۆل: سڵاو، دیارە نینا خانیت.

نینا: سڵاو بەڵێ.. ئەی جەنابت؟

# (( ئەڵقەی شەست و چوار))

شەپۆل: من ناوم شەپۆلە، کوڕی ڕزگاری مام فەریقی سەعاتچیم.

نینا: ئۆو.. کاک شەپۆل، لە کەیەوە نەمبینیوی، ماشەڵڵا زۆر گۆڕاوی.. دە فەرموو فەرموو توخوا وەرە ژوورەوە.

شەپۆل: زۆر سوپاس نینا خان، ماشەڵڵا تۆش زۆر گەورە بوویت خوشکەکەم، هەر تەواو تەواو گۆڕاویت، بە هیچ شێوەیەک ناچیتەوە سەر منداڵیت.

نینا(( دەست بە دەمییەوە ئەگرێ و پێکەنین)): ئەی بۆ هەرچی کەسێ ئەمبینێ، ئەڵێ هیچ نەگۆڕاوی؟

شەپۆل: ئەوە وا هەست ئەکەن، ئەگینا ئۆووووو.

نینا: دەی ئاخر هەروا لەبەردەرگاوە چۆن ئەبێ کاکە؟ خۆ تۆ بێگانە نیت؟

شەپۆل: نا بە هیچ جۆرێک، هەر خۆم بە کوڕی ماڵەکەتان ئەزانم و وەک برای ڕاستەقینەت وام.. بەڵام نازانم بزانی یان نا، من هەر خۆم کەمێک شەرمنم.. باوەڕکە چاوەڕێم کرد تا مێردەکەت ئەچێتە دەرەوە، ئەوسا لە ڕووم هات لە دەرگابەم.. زۆر سوپاس نینا خان.

نینا: نا نا زۆر جار بۆ ئاواشم وەسف کردوون، حەیفێ دابڕاین لە یەک ئەگینا ئێمە یەک ماڵ بووین.. بەخوا قەت لە بیرم ناچنەوە.. بەڵام ئیتر وا پانزە ساڵێ ئەبێ نەمبینیون، لێم مەگرە نەمناسیتەوە.. ئەی توخوا دایک و خوشکان و برایان چۆنن؟

شەپۆل: سەلامەت بی، باشن.. ئەگەر دەرفەت بوو باسی ئەوانیشت بۆ ئەکەم.. بەڵام باوکم و باوکت یادیان بەخێر، ئەوان هەر پێکەوە بوون، هیچ دانەبڕان.

نینا: وەیش بەداخەوە، باوکیشت ئەمری خوای کرد؟ زوو زوو ئەهات ڕاست ئەکەی، خوا عافوویکا.

شەپۆل: بەڵێ ئەویش هەر وەکو باوکی ڕەحمەتیت بە پیلانێک کوژرا.. بەهەرحاڵ نینا گیان، جوان نییە زۆر لەبەردەرگا بوەستین، نازانم چۆن بتبینم؟ هەندێ شتی باوکت کەوتۆتە لای ئێمە، باوکم لە دەفتەرەکەی خۆیا هەمووی نووسیوە، وتم بەڵکو پێکەوە بیانبینین و بۆت بگێڕمەوە، ناشوکری نەبێ، هەر تۆ ماویت لە خێزانەکەیا.

نینا: شتی وەک چی کاکە شەپۆل؟

Cut

دیمەنی – ١٣٢٩ – ڕ- / د – چایخانەکە:

(( هەندرێن و هاوڕێ دانیشتوون))

هاوڕێ: لەگەڵ تەرمەکەیا ڕۆشتووەو نەگەڕاوەتەوە.

هەندرێن: بە ڕاستی زۆر بەوەفا بوو لەگەڵیا.

هاوڕێ: کورە کاک حمە خدر نمونەی نییە نی.. کورە ئەوە جارێکیان ئەم ئەردەڵانە مەرحومە زۆر لە کاک حمە خدر نیگەران بوو، وایئەزانی ئەو بۆتە باعیسی ڕسقی ئەو و ناهێڵێ زۆری دەستکەوێ، (( کورتە پێکەنینێک)) ئاخر ئەڵێ پیاو پێکەنینی دێ.

هەندرێن: ئەی وایە زۆرجار لە ناخۆشترین ڕووداوا پێکەنین ئەیگرێ، بە تایبەت ئێمە، ئەوەندەمان ئازار چەشتووە، کە کارەساتێک ئەگێڕینەوە، دیوە پێکەنیناوییەکەی باشتر ئەبینین.. ئێ قسەکەت تەواوکە.

هاوڕێ: ئیتر هەستا عەرەبانەی فرۆشت و سوێندی خوارد حەماڵیی نەکا.

هەندرێن: ئێ؟

هاوڕێ: کاکە ئەوەی شکی بردو باقیەکەی قەرز کردو عەرەبانەیەکی گەورەی کڕی و مەنجەڵ و پەرەمێزو ئیتر ئەوەی نۆکاو و قاورمەو لەفە پێویستی بێ کڕی و هاتە بەر چایخانەکە.. بەڵام لەسەر جادە گشتییەکە.

هەندرێن: ئێ ئێ ئەم بەزمەم نەبیستووە.

هاوڕێ: هەر یەکەم ڕۆژ دایناو کاکە لەولاوە سەیارەیەکی بۆ نازڵ بوو، خۆی کێشا بە عەرەبانەیاو وەختا بوو ئەردەڵانیش بکوژێ، بە پەلە نەجاتی بوو.. هههەه، بەوە کەوتە ژێر باری قەرزێکی گەورەشەوە.. ئەمە بە حسابی خۆی سەرچاوەی ڕسقەکەی گۆڕی.

هەندرێن: هەی داماو.. کورە داماو هەر داماوە کاکە هاوڕێ.

هاوڕێ: وەڵا دروست وایە، جا کاک حەمە خدریش چەند باش بوو لەگەڵیا خوایە، باوەڕ ئەکەی عەرەبانەیەکی حەماڵیی بۆ کڕییەوەو وتی دەبڕۆ ئیشکەو قەرزەکانت بدەرەوە. وتی ئەی قەرزی ئەم عەرەبانەیە، کاک حمە خدر وتی ئەوەیان بە گەردن ئازایی بۆ خۆت.. هیچی لێ وەرنەگرتەوە.

هەندرێن: وەڵا کاک حمەخدر، دەستودڵی زۆر باشە.. ئەردەڵانیش خوا عافویکا، هەر بەو نەگبەتیەی خۆیەوە سەری نایەوە.

Cut

دیمەنی – ١٣٣٠ – ڕ/ د – ڕێی سەرەکی بۆ ناوشار:

Mute

(( خدر بە سەیارەکەی خۆی لە مدخەلی شارەوە دەرئەکەوێ و دێتەوە ناوشار))

Cut

دیمەنی – ١٣٣١ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٢٨ –ڕ/د –بەر ماڵی ئاوا:

شەپۆل: هەمووی پارەی تێکەڵ بووی هەردووکیانە، باوکم هەندێکیانی کە نوسیووە، جیای کردوونەتەوە، زۆر ڕوونە، بەڵام یەک دوو موڵکی تیایە، نازانم چۆن ساغیان بکەینەوە، هی هەردووکیانە.

نینا(( متحیر)): وەڵا کاکە شەپۆل من سەیری دەفتەرەکانی باوکمم کردووە، هیچ شتێکی تیا نییە هاوبەش بێ یان کەوتبێتە لای باوکی ڕەحمەتیت.. سەیر نییە.

شەپۆل: وەڵا سەیرە! ئەی ئەو هەمووە چییە لای باوکم، موڵکەو پارەیەو ئیتر خۆ ئەوەی لای منە وا دەرئەخا هەر پێکەوە ئیشیان کردبێ.

نینا: ئەو شتانە زۆرن؟

شەپۆل: لە زۆر زیاترن.. هەه ئەوەم پێ سەیرە باوکی ڕەحمەتیت هیچ ئاماژەی پێ نەدابێ.. تۆ بڵێی مەبەستی کەسێکیتر نەبووبێ و بە ناوی باوکتەوە نەینوسیی بێ؟

نینا: وەڵا خۆ هیچ، ئەوە ئەزانم زۆر پێکەوە بوون و ئەشهات بۆ ماڵی ئێمە.. ئەی ئەگەر پێتە با سەیرێکیان بکەین.

شەپۆل: نا ئێستا پێم نییە، کۆمەڵێ مامەڵەی زۆرن، هی ئەوە نین لێرە قسەی تیا بکەین.

نینا: دەی کەواتە ژمارەکەتم بدەرێ، شەو لەگەڵ ئاوا دێین و ماڵەکەتان ئەدۆزینەوە، لە کوێوەن؟

شەپۆل: نا نینا گیان توخوا جارێ ئەو تێمەگەیەنە، شتەکە با هەر لە نیوان خوشک و برایەتیی خۆانا بێ تا ساغی ئەکەینەوە.. کێ ئەڵێ من بە هەڵەدا نەچووم، یان کاک شۆڕشێکیتر نییە.

نینا: ئەی وەڵا نازانم کاکە شەپۆل، ناتوانم هیچی لێ بشارمەوە.

شەپۆل: شت شاردنەوە نییە خوشکەکەم، خوا ئەیزانێ لەگەڵ دڵکەشی خوشکم فەرقت ناکەم.. جا شتەکەش تایبەتە بە خۆت، کێ ئەڵێ زۆر دەرناچێ، کێ ناڵێ کەم؟ با یەکلایکەینەوە ئەوسا چۆن پێی ئەڵێی پێی بڵێ، بەخوا من لە ڕووم نایەت ئەو ببینم.. کاکە تۆ نازانی پیاوانیش چۆنن، هەر لە خۆیانەوە هیچیش نییە، دڵ کرمێ ئەکەن.

نینا: نەبەخوا، ئاوا زۆر کراوەیە، زوو لە شت تێئەگا.. پیاو باش ئەناسێ.. هەر بتبینێ ئەزانێ هیچ مەرامێکت نییەو وەک خوشکی خۆت سەیرم ئەکەی.. بەخوا ئەوی تیا نەبێ، زۆر قورسە بە تەنیا خۆم ئەوە بکەم، ئەوە بزانێ ئینجا ئەبێ بە کێشە، نەک تۆ ببینێ.

شەپۆل: بە هەرحاڵ، با ژمارەکەمت لابێ، هەر کاتێ ویستت بێی بەدەم ئەو شتانەوە، ئەوە تێلم بۆ بکە.. تۆ هەر شوێنێک دیاری ئەکەی من دێم بۆ ئەوێ.. ڕاستت بوێ، ناتوانم هێشتا هیچ نەبووە، ڕووبەڕووی بمەوە.. هەر خۆشم تۆزێ لە دەوڵەمەند ئەسڵەممەوە.

نینا (( بزە )): ئۆو بڵێ ڕقت لە دەوڵەمەندە؟

شەپۆل: نا ڕق نییە، بەڵام خۆ بەزلزانن و هەر خوانەخواست هەڵەیەکی بچووک بکەی لەو حساباتەیا، ئیتر نایبڕێتەوەو هەر زۆر بە نەزانیشمان ئەبینێ، لەبەرئەوە خۆت ساغی بکەرەوەو کە وەکو هێلکە پاکمان کرد، ئەوسا با ئەویش بیزانێ کێشە نییە.

نینا: تێگەیشتم.. باشە ژمارەکەم بدەرێ، بە تەلەفونیش قسە ئەکەینەوە.

شەپۆل: بەڵام تو گۆڕی باوکت، با ئاگای لە تەلەفونیش نەبێت، کاکە بە کورتییەکەی لە دڵپیسیی پیاو زۆر ئەترسم، ئیتر لە خۆیەوە هەزارو یەک گومان ئەکا.

نینا: باشە کاکە شەپۆل، کەواتە ئەبێ لە دەرفەتا قسە بکەین، با هەلێ بقۆزمەوە قسە ئەکەینەوە.

شەپۆل: خۆتۆ دەستوخەتی باوکت ئەناسیتەوە؟

نینا: ئەی چۆن؟

شەپۆل: کەواتە هەر پێویستیش بە تەلەفون ناکا.. هەر لە شوێنێک یەکترمان بینی شتێک ئەهێنم کە باوکت نوسیبێتی، تا بزانی من بە هەڵەدا نەچوم؟

نینا: ئافەرین، ئەوە زۆر باشە، زوو بۆمان دەرئەکەوێ.. دەی کەواتە ژمارەکەم بدەرێ و من شوێنێکی گشتیی دیاری ئەکەم و کاتەکەیت پێ ئەڵێم.. ئێستا با بچمە ژوورەوە، ئەو سەیارەیە وەڕسی کردم، سێ چوار جار بەمناوەیا هات.

Cut

دیمەنی – ١٣٣٢ – ڕ – عەسر/ د – کۆڵانێک:

Mute

(( شەنیا بە سەیارەکەی دێت و لەبەر دەرگایەکدا ئەوەستێ و دائەبەزێ.. لە دەرگا ئەدات، سەیارەکەی دڵنیاشی تیایە دێت و دوور بەدوور ئەوەستێ.. پاش کەمێک، دەرگا ئەکرێتەوەو ژنێک بەخێرهاتنی شەنیا ئەکات و یەکتر ماچ ئەکەن))

شەنیا: من شەنیام.

ژن: ئەزانم پێیان وتووم.. (( بەخێر هاتن و چوونە ژوورەوە))

(( سەیارەکەی دڵنیا نزیکتر ئەبێتەوەو متابعە))

_______ تابع ________________ Cut ____________________

دیمەنی – ١٣٣٣ – متبوع – ڕ/ن – ناو ئەوماڵەی شەنیا چوو:

(( لە ژوورەوە ڕێبین چاوەڕوانی ئەکات و تەوقەو بەخێر هاتن و ئاماژەی ژێر زەمینێکی بۆ ئەکات و لەوێوە بەرەو دەرگایەکیتری کۆڵان و گەڕەکی تر دەرئەکەوێ))

ڕێبین(( ئاماژەی سەیارەکەی خۆی ئەکا)): فەرموو تۆزێ خێرا سەرکەوە.

شەنیا: باشە.

(( سەرئەکەون و سەیارە ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٣٣٤ – ڕ/ د – سەر بینای تەلارەکەی ئاکۆو گێلاس:

(( ئاکۆ شەروالّی لە پێیەو تۆزو خۆلاوی، کرێکارێک دێتە لای))

کرێکار: قوربان وەستا ئەڵێ چەند سەعاتمان بۆ حساب ئەکا بمێنینەوە.

ئاکۆ: کورە مەمنونتان ئەبم توخوا ئەمڕۆ سەعاتی زیادە ئیش مەکەن، ئەها پسام.

کرێکار: جا خۆ تۆ هەر لەبەر سێبەرەکە بوویت کاک ئاکۆ، ئەی لە بری ئێمە بوویتایە چیت ئەکرد؟

ئاکۆ: کورە بابە ئەوی بە ئێوە ئەکرێ، چۆن بە پیرێکی وەک من ئەکرێ؟ تازە من لە تەمەنی ئیشا نەماوم.

کرێکار: یەعنی هیچ؟

ئاکۆ: ئەرەوەڵا بەساقەوبم با ئەمڕۆ نەبێ کاکەگوڵ.

(( هەڵئەسێت و خۆی کۆئەکاتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣٣٥ – ڕ/ د – کۆلانێک – ناو سەیارەکەی دڵنیا:

(( سەیارەکەی شەنیا لەبەرماڵێکا وەستاوە.. دڵنیا لەوسەری کۆلانەوە لەگەڵ شۆفێرەکەی چاوەڕوانی ئەکەن.. دڵنیا تێل ئەکا ))

دڵنیا: بەساقەوبم ئەوە دوو سەعاتە دوو.. ئێستا هەر خەڵکی ئەم گەڕەکە نالێن ئەم کچە بۆ لەدواوە لەگەڵ ئەو کوڕەیا لەسەیارەیان و هەر وەستاون؟ جا خۆ ناسیاوێک بێت، ئەبم بە فلیم.

سەرچڵ(( دەنگ )): ڕاست ئەکەی گیانەکەم بجوڵێ.. بەڵام دوور مەکەوەرەوە.. وابێ لە شوێنێکیتریشەوە چاوت لە سەیارەکە بێ.

دڵنیا: شوێن نییە سەرچڵ گیان، ئادەی با بە سایەقەکە بڵێم. (( بۆ سایەق)) ئەرێ شوێنێکتر هەیە بچین و هەر چاویشمان لە سەیارەکەی بێ؟

سایەق: نازانم، ئەبێ بگەڕێین.

دڵنیا(( بۆ سەرچڵ)): نییە بەقوربان نی.. چی بکەم؟

سەرچڵ: دەی ئەوە ئیشەکەیە من بڵێم چی لەدەورتگەڕێم.

دڵنیا: تۆ سەیری ئەم ئیشە جوانانە بۆ منی ئەدۆزیتەوە؟

سەرچڵ: ئەمە دوا ئیشە بە دڵت نەبێ.. ئیشێکیتریان پێ وتووم، هەر زۆر ..........

دڵنیا(( قسەکەی ئەبڕێ)): بوەستە بوەستە دایخەرەوە، جوڵەیەکم لەماڵەکەیا بینی، بەڵکو ئەو بێ.

(( دەنگ نامێنێت و دڵنیا چاودێریی ئەکات ))

Cut

دیمەنی – ١٣٣٦ – ش/ د – ناو سەیارەی خدر:

(( خدرو نارەوەن لە ناو سەیارەکەی خدر لە شوێنێک وەستاون))

نارەوەن: کاکە نەقیب ڕاهۆز تێ ناگا، ئەو گومانی لە دڵسۆزیی شەنیا هەیە.

خدر: منیش گومانم لێی هەیە.

نارەوەن: کاکە ئەو کچە شێت و هاری ئامۆیە، باوەڕ ناکەی چۆن قورگی پڕ ئەبوو لە حەسرەت و گریان کە ناوی ئامۆی ئەهێنا.. ئینجا منیشی بردە دەرەوە ئەو قسانەی بۆ کردم، ئەیزانی ژوورەکە جیهازی تیایە.. خۆ لەناو ژوورەکەیا هیچی نەوت، هەر قسەی ڕەمزی بۆ ئەکردم.

خدر: نارە گیان، ئەی خۆ گەر درۆت لەگەڵ بکات و بیەوێ بکەویتە داوێکەوە، پێت ناڵێ بە نیازی ئەوەم؟.. تۆ گوێ لە من بگرە، ئەو کچە هەرچییەکی وتووە بیری خۆتی بەرەوەو لە ئیشەکەت بەردەوامبەو ئەگەر ڕەمزیش داوای ئیشەکەی لێکردی لە بری دارەوان، بڵێ باشە.

نارەوەن: بە قسەتان ناکەم، لەبەرئەوەی ئێوە نەتانزانی ئەو کچە چەند پڕ بوو لە هەستی خۆشویستنی من، کە قسەی بۆ ئەکردم.. خەمی منی بوو، هەر بە عالەمی ئاشکرا هەموو شتێکی باسکرد، بەڵام ئێوە چونکە خۆیتان نەبینی، لە قسەکانی ئەکۆڵنەوە، منیش لە هەستی ئەکۆڵمەوە.

خدر: ئیش بە عینادیی مەکە بەقوربان، ئەوە فەرمانە کە نەقیب ڕاهۆز پێی وتووی، ڕایەکی ئاسایی نییە وەک تۆ تێیگەیشتووی.

نارەوەن: باشە.. بە قسەت ئەکەم، بەڵام مەرجی تێ ئەخەم.

خدر: چۆن؟

نارەوەن: بە حساب من و دیدەوان ڕێک نەکەوتووین بۆ هاوسەرگیریی و ئەو ئیشە؟

خدر: بەڵێ.

نارەوەن: باشە پێی ئەڵێم چاوەڕێ بکە تا دیدەوان ئەگەڕێتەوە، ئەوسا ئیشەکەش ئەکەین.. با وا بزانێ زۆر بە پەرۆشم بۆ گەڕانەوەی دیدەوان، کە بە حساب بۆ هاوسەرگیرییەکەیە پەرۆشم نەک ئیشەکە.. ئەوسا ئەگەر خۆیان دیدەوانیان فڕاندبێ، ئەویش ئەگێڕنەوە. چۆن وەڵامێکە؟

خدر: هەر بە دڵم نییە.

نارەوەن: ئەمجارە بۆ؟ یەعنی بە پێی خۆم نەچمە ئاگرەکەوەو نەمسوتێنن بە دڵتان نابێ؟

خدر: نارە گیان تۆ لەبەر بەرپرسیارێتیی مناڵ.. دڵنیابە لە خۆت زیاتر ئەتپارێزم و ئەمەوێ شتێ بکەین نەکەویە ئاگرەکەوە، بۆ نەقیب ڕاهۆزیش هەروایە.. تکایە کەللە ڕەقیی مەکە، هەموو باش ئەزانین ڕەمزی کێیە.

نارەوەن: من لەوە زیاتر نایەمە پێشەوە، نەقیب ڕاهۆزیش مەرجەکەمی بەدڵ نەبێ، ئامادەم دەست لەو کارەم هەڵگرم.. خۆ خۆمم نەدۆزیوەتەوە کاکە؟

خدر: دەی ئیتر من قسەم پێ نەما، کەللەڕەقیت گەیشتە ترۆپک.. بزانە ڕای نەقیب ڕاهۆز چۆنە؟

نارەوەن: باشە با تێلی بۆ بکەم.

(( مۆبایل دەرئەهێنێت و تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٣٣٧ – ش/ د – ماڵی کۆڵانەکە:

(( شەنیا لە ماڵەکە دێتە دەرەوەو خواحافیزیی لە ژنەکە.. سواری سەیارە ئەبێت و ئەڕوا، سەیارەکەی دڵنیاش بەدوایا ))

**(( تێبینی: ئەکرێ یەک دوو دیمەنیتری شەنیا نیشان بدرێ، کە بەرەو ماڵی ڕەمزی ئەچێت و تا ئەگاتە بەر ماڵی ڕەمزی.. سەیارەی دڵنیاش بەدوایەوە ))**

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١٣٣٨ – ش/د – بەرماڵی ئاوا:

(( ئاوا ئەگاتە بەردەمی گەراج و هۆڕن لێ ئەدات و نینا بە پەلە ڕائەکا دەرگای گەراجی بۆ ئەکاتەوەو بەخێرهاتنەوەو وەڵام))

Cut

دیمەنی – ١٣٣٩ – متبوع – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

شەنیا: بەڵێ هەمووی خەتای خۆتە.. بابەتێکی وا هەستیار چۆن ئەدەیتە دەست ئەو دیدەوانە خڵەفاوەوە؟.. ئەگەر وا بڕوا، تۆ خدریشت لە دەست ئەچێ، کە چەند بە چەندە پلانی بۆ دائەنێی، ئەوسا ساماڵی داماویش بە تەنیا هیچی بۆ ناکرێ.

ڕەمزی: یەعنی نارەوەن وتی من کار بە قسەی ڕەمزی ناکەم؟

شەنیا: ئەتوانی تەلەفونی بۆ بکەی.. ئەڵی من هەر کۆمپانیاکەش جێ ئەهێڵم و ئەو ئیشەش ناکەم و ناهێڵم لە خدریش نزیک بکەونەوە.

ڕەمزی، وەڵا باوکم نارەوەنیشمان لێ بوو بە گوندە.. جا توخوا ئێستا تۆ بڵێ ئەو دیدەوانە سەگە شایانی ئەوە نییە بتۆپێنرێ؟

شەنیا: وەڵاهی بەدەست من بووایە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە ئەمتۆپاند، ئەوە کەی بەشەرە تا پرس و ڕای پێ بکرێ؟

ڕەمزی: ئێستا تەلەفون بۆ نارەوەن ئەکەم و ئەگەر بیری لێ کردبۆوەو هەمان قسەی هەبوو، ئەوسا بیرێکی لێ ئەکەمەوە کێشە نییە.. هەموانیش ئاگادارکەرەوە بێن بۆ ئێرە لە ماوەی سەعاتێکا.. با چارەنوسی ئەو سەگەش دیاریکەین کە ئەم هەموو هەڵەیەی پێ کردووین.. ئەوە ئەگەر دیدەوان نەدا بەدەم نارەوەنەوە، چۆن زاتی ئەکرد ئاوا وەڵامت بداتەوە؟

شەنیا: وەڵا هەر باکیشی نەبوو، ئەیوت بڕۆن بە ڕێی خۆتانەوە.

ڕەمزی: ئاوا؟ ڕەمزی بڕوا بە ڕێی خۆیەوە؟

شەنیا: ئەرەوەڵا وای ئەوت.

ڕەمزی: هەموویان بانگکە.. با بڕیار لە چارەنوسی ئەو دوو مێش و مەگەزە بدەین.

شەنیا: هەر ئەوانەی سەرەوە؟

ڕەمزی: بە خوا تۆش کەری.. ئەی خۆ منداڵ و مەزمی دنیا لە ماڵەکەم کۆ ناکەیتەوە، خۆت و ڕەوەزو سەرچڵ.

شەنیا: سوپاس، منت هێنایە سەرەوە.

ڕەمزی: ئەبووایە تۆ لە بری دیدەوانیش بوویتایە، دڵنیابە کاک دارەوان تۆی ببینیایە، ئێستا ژنی سێیەمی ئەبووی.

شەنیا: جا کوا ژنی بوومایە؟ ئەوە ببووایە دەمێک بوو نارەوەنم بۆ لەناوبردبووی.. (( تەلەفون ئەکا )) ئەلو کاک ڕەوەز.

Cut

دیمەنی – ١٣٤٠ – ش/ن – ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و ئاکۆ زۆر ماندووە، جلی پیس و ئازاریشی هەیە))

گێلاس(( پێکەنین)): دە باشە ئیتر خۆت لە حەوت ساڵان بۆ ڕاستکردوومەوە. هههههە.

ئاکۆ: باوەڕ ئەکەی بەرگە ناگرم.

گێلاس(( سوعبەت)): دە مەیکە!!!!

ئاکۆ: ناکرێ گێلاس گیان.. بەخوا ئاگات لە هەموو شتێک نەبێ، بە نیوەناچڵ بەڕێی ئەکەن.. ناکرێ ئاگاداری هەموویان نەبم.

گێلاس: ئەزانم زۆر ماندووی ئاکۆ گیان، مەبەستم ئەوەیە ڕەحمێکیش بە خۆت بکە.. لەوێش پشوو بدە، تازە لەو تەمەنەیا نەماوی وەک گەنجێک ئیش بکەی.

ئاکۆ: دە ئاوا دوو قسەی خۆشم بۆ بکە، ماندوویێتیم دەرئەچێ.

گێلاس(( پکەنین)): کورە هەر تۆو قسەی خۆش!! هەر لە ماڵەوە نا، ئیتر لەسەر ئیش بە تەلەفونیش وەڕست ئەکەم ئەوەندە بەقوربان و بەساقەو ئەبم.. بەخوا هەر بەڕاست پێت بڵێم دڵم زۆر لاتە، بەس وەک خۆت ئەڵێی، ناکرێ خۆم بێم.

ئاکۆ: نا نا تۆ نا.. خۆم وردە وردە بەڕێی ئەکەم و خزمێکیش ئەهێنم دڵسۆز بێت و ئەویش هاوکارییەکم بکا، خەمت نەبێ، ئیتر وەک ماوەی پێشوو ناکەم.

Cut

دیمەنی – ١٣٤١ – ش/ن – ماڵی ئاوا:

(( ئاواو نینا ))

ئاوا: ئێ کە تۆ بزانی کوڕی کاک ڕزگارە کێشە نییە، وەک خۆت ئەڵێی وەک خوشک و برا وابوون.. بزانە شتەکە چییە؟

نینا: زۆر شەرمنە ئاوا، باوەڕکە ئەتوت منالە، دەمی گۆی نەئەکرد قسە بکا.

ئاوا: بەخوا باش بوو ئەڵێ با ئەو نەزانێ، منیش حەزم لە پیاوی شەرمن نییە، نازانم چی لەگەڵا بڵێم، بەتایبەت کە تێکەڵی خۆشتان بێ بۆ من زۆر ناخۆشە چامرلغ بم.

نینا: هەهە کەس حەددی نییە تۆ فەرامۆشکا.. ئێستاش پێمخۆشە بێیت و ئەوسا تێ بگا، من شتێکم نییە خۆت ئاگادار نەبی، تەنانەت ئەگەر بەڵێنی پێچەوانەکەشیم دابێ.

ئاوا: ئەزانم چاوەکەم، تۆ بڵێی گومان لە ڕاستگۆییت بکەم؟ یەکەمجار نا، با نەیەم، بەڵام داهاتوو بانگی ئەکەین بۆ ماڵەوەو یەکتر ئەناسین، ئەوسا تا یەکلای ئەکەیتەوە هەر پێکەوە ئەبین.

نینا: کەواتە با زوو بێت.

ئاوا: بە دڵی خۆت بکە گیان.

نینا: باشە بەیانی لە کۆمپانیاوە تەلەفونی بۆ ئەکەم و ئەڵێم دوای دەوام لە قاوەخانەیەک.

ئاوا: ئا.. هەر خۆشم ئەتگەیەنم، بەڵام دانابەزم.

نینا: من پێمخۆشە دابەزیت، تۆش بە دڵی خۆت بکە بەقوربان.. با بزانین ئەمە چییە زیندوو بۆتەوە؟

ئاوا: ئەزانی هەر کەسێکیتر بووایە ئەیخواردو تۆش ئاگات لە هیچ نەئەبوو.

نینا: ئۆو ئاوا گیان حەیفت نەکرد؟ ماڵی کاک ڕزگار لەوجۆرە نیین. زۆر باشن زۆر زۆر.

Cut

دیمەنی – ١٣٤٢ – ش / ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و ڕەوەزو سەرچڵ و شەنیا ))

ڕەمزی: ئیتر ئەوە حاڵی سەرۆکەکەیە کە زانیتان، من پێم باشە ئەم لیمفی شێرپەنجەیە، تا زووە لە کۆڵ بکرێتەوەو بە هەڵەیترمانا نەبا.. کاتی خۆیشی کاک دارەوان هەر ڕقی لێی بوو، قەت بە سەرۆکی خۆی نەئەزانی، ماوەیەکیش بۆی ئەگەڕا بیکوژێ.. جا کێ لەگەڵ ئەم ڕایەی منا نییە با قسە بکا.

شەنیا: من ڕام وایە نارەوەنیش ببرێتە لای ئەو و پێکەوە بیاننێرین بۆ دۆزەخ، با لەوێ هاوسەرگیرییەکەیان بکەن.

ڕەوەز(( زۆر بە هێمنی )): من هەر زۆر پشتت ئەگرم شەنیا.

سەرچڵ: ئیشەکە بە ڕق مەکەن ڕەوەز.. تۆ ڕقت لە ئاوای کوڕیەتی و شەنیاش لە ئامۆیان.. بیرتان نەچێ هاوسەری کاک دارەوان بووە.

شەنیا: بەڵێ ئەوەتا ئەڵێ تا دیدەوان نەیەتەوە ئیش ناکەم، ئەوە مانای وایە دیدەوانی لە کاک دارەوان زیاتر ویستووە.

سەرچڵ: تازە ئەو ڕۆشتووەو ئەم هەقی خۆیەتی شوو بکاتەوە.

ڕەوەز: باشە با قسەی کاک سەرچڵ بێ، واز لە نارەوەن ئەهێنین، تازە نهێنییەکەی لایە، با لەملاولا باسی بکات تا ئەکەوێتە دەمی پۆلیس و ئاسایش و هەر هەموومان باڵبەست ئەکرێین.

شەنیا: نابێ قسەی یەکێک زاڵ بێ، کاک ڕەمزی نەبێت.. بۆ ئەوەی بە دەردەکەی دیدەوان نەچینەوە جاریتریش.

سەرچڵ: کەواتە با کاک ڕەمزی بڕیار بدا.

ڕەمزی: باشە هەڵبەت ئێوە دوو ڕای جوانتان هەیەو ڕای سێیەمیش دەرگاکە دائەخاو قسەی تیا ناکرێتەوە.

ڕەوەز: بەڵێ قسەی تۆ لە سەروو قسەی ئێمەوەیە.

ڕەمزی: کوشتنی دیدەوان لێگەڕێن بۆ خۆم هەرکاتێ دەستم بەتاڵ بوو، ئەچم نەجاتی ئەدەم.. دوای ئەوەش تەرمەکەی فڕێ ئەدەینە کەنەلاَنێکەوەو پۆلیس ئەیدۆزێتەوەو ئەو کاتە نارەوەنیش ئەو هیوایەی نامێنێ بۆ هاوسەرگیریی و ئیشەکە.. دوای چەند ڕۆژێک پاش ئەوەی چاوەڕوانییەکەی تێک ئەشکێ، ئەمجارەیان با قسەی ئەوبێ، خۆم ئەچم و.......

شەنیا(( قسەی پێ ئەبڕێ)): نەخێر من لەگەڵ ئەوەیا نیم خۆت بچی، بە قژ ڕاکێشان تا ئێرەی بێنن و ڕازی نەبوو، بیدەنە دەست خۆمەوە بیکوژم، ئەوسا ئەبینن چۆن داهێنانێکتان لە کوشتنا بۆ ئەخوڵقێنم.

ڕەمزی: شەنیا بێدەنگ بە تا قسە تەواو ئەکەم، قسەی من بۆ پچڕاندن نییە.. ئیتر قسەم پێ نەبڕی.

شەنیا: ببورە.. سەرچاو.

ڕەمزی: خۆم ئەچم و باسی ئیشەکەی لا ئەکەمەوە.. ئەگەر هەر نەهاتە پێشەوە، ئەوسا بە ناچاریی و بۆ پاراستنی نهێنییەکە، با سەرچڵ بیکوژێ.

سەرچڵ: ئەمرەکەی.. ئەمزانی کوشتنەکەی ئەدەیتە من، چونکە وات ئەزانی پێم ناخۆشە بیکوژم.. بەلاَم من کوشتنی هیچ کەسێکم لەبەردڵ لا گران نابێ.. ئەگەر وەک ڕامالێش تێکەڵم بێ، ڕامالْ بەو هەموو متمانەیەوە کە بە منی هەبوو، زۆر خوێنساردانە کوشتم.. جا نارەوەن هههە.

ڕەمزی: دەستخۆش، ئەبێ هەموو وابین.

Cut

دیمەنی – ١٣٤٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر بێتاقەت و نارەوەن گرژ))

نارەوەن: کوڕم تۆ لە من تێبگە، ئەوی من ئەیزانم تۆ نایزانی.

خدر: توخوا تکایە نارە گیان، من ئەزانم تۆ فریوی خۆ نواندنی ئەو کچەت خواردووە، ئەو کچە شتی زۆر لە ژێر سەرایە، نەدیو و نەناس چۆن ئەتوانی باوەڕی پێ بکەیت، کە خۆت ئەزانی چی بە ئامۆی داماو نەکرد! بۆ ئامۆ بە گاڵتە لەبەرچاوی ڕەش بووە؟

نارەوەن: خدر گیان هەر ئەوە نییە باپیرەکەم.. ئەبێ من وا خۆم نیشان بدەم، کە ڕێککەوتنێکی نهێنیم لەگەڵ دیدەوان کردووەو ئەو خاوەنی ئەو پرۆژەیەیە نەک ڕەمزی، نازانم بۆ تێناگەن.. ئەگەر بە قسەی ڕەمزی بڵێم ئۆکەی من ئامادەم، باوەڕ بکە سوور ئەزانن ئیش بۆ لایەک ئەکەین.

خدر: تۆ وا ئەزانی ئەو ڕۆژەی ڕەمزی هات و وتی گاڵتە بە دیدەوان مەکەن، هەر بۆ ئەوە هاتبوو؟ یان هات بیسەلمێنێ کە ئەو ئەتوانێ هەموو شتێک باش بکاتەوە، گەر تێکیش بچێ.. ئەو مەسجەی سەرەتا بۆ دیدەوان بوو ئەوسا بۆ ئێمە.. من لەو بڕوایەدام لەو ڕۆژەوەی کۆمپانیای بۆ داناوین، بناغەی ئیشکردنی ئێمەی بۆ ئەو ئیشانە داڕشتبێ.. من ئێستا تەواو هەست بەوە ئەکەم، ڕەمزی لەبری دارەوان و هەڵشۆو میرەکەیە.

نارەوەن: نا دیدەوانە، بە پێی ئەوەی دیدەوان بە حساب دێتە پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە لەگەڵماو سەرمایەو خەڵکیش هەر خۆی دابینی ئەکا.. ئەو لەوێوە دیار نەما کە مافیاکە چۆتە دەرەوەی وڵات و نەگەڕاوەتەوە، چاوەڕێی ئەو بوو.

خدر: نارە گیان، ئیشەکەی ئێمە ئاڵۆزو هەستیارە، پەیوەندیی بە متمانەوە نییە، بەڵام ڕەنگە ئەوەی من ئەیزانم، نە تۆو نە نەقیب ڕاهۆزیش نەیزانن.. ئەویش هەر پێویستیی بە داڕشتنی بناغە هەیە.. خۆ ئێمە لێیان ناگەڕێین دوور بە دوور هەر سەیریانکەین.. هێڵی زۆر هەیە ئیشیان لەسەر ئەکەن دڵنیابە، بۆیە باشترە قسەکەی ئێمە وەرگری.

نارەوەن: یەعنی بە دایکی خۆشتی نالێی؟

خدر: نا ناکرێ.. لە منالییەوە ئەوە فێر کراوم بۆ ئەو ئیشە، کە شتێک پەیوەندی بە کەسێکەوە نەبوو، وەک حەرام وایە، ناکرێ خۆم لەو تابۆیە بدەم.. بۆ یەکجاریش تا ئێستا ئەوەم نەکردووە.

نارەوەن: دەستخۆش، ئەوە زۆر باشە، ئەوە سروشتە کۆنەکەم جوڵاندمی وا بڵێم، هەهە ئەگینا باسی ئەمانەتان زۆر بۆ کردووم.

خدر: ئەی تەلەفون بۆ ڕەمزی ناکەیتەوە؟

نارەوەن: نا تازە کۆمپانیام داخست و تریفەشم ناردەوە بۆماڵەوە.

خدر: ئیتر کەللەڕەقییەکەت بردە سەر.

نارەوەن: دڵنیابە خۆیان دێنە ئێرەو پێڵاویشمان ماچ ئەکەن، تێهەڵچینەوە.

خدر: دوژمنت بە بچووک مەگرە.. من لە کەمێکیترەوە چایخانەکە بە هاوڕێ ئەگوێزمەوە بەردەمی ئۆفیسەکە.. بە تریفە ئەڵێم بێتەوە ئاگای لێت بێ.

نارەوەن(( سوعبەت)): هینە! ئۆفیسەکەم بچێتە ناو چایخانەوە!!!

خدر: ئەم ماوەیە ئەبێ وابێ و هیچیشتان بە بێ من نایەن و ناچن، منیش ئەوە بە کەللەڕەقیی ئەکەم و(( سوعبەت، پەنجەی ئەگرێ بە دەمییەوە)) فزەشت لێوە نایەت.

Cut

دیمەنی – ١٣٤٤ – ڕ/د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( دڵنیاو سەرچڵ))

دڵنیا: واو هەواڵەکانی ئەمڕۆ زۆر باشن.. سەیارەی تازەو پاداشتی ئیشەکەم و تەواوبوونی ئەرکەکەم و یەک هەواڵیتر ماوە، ئەویشم پێ بڵێ و ئیتر بەڕاستی ئەمڕۆ جەژنە.

سەرچڵ: داواکردنەکەت ئەڵێی ئەزانم.. ئەویش دوای ئەم ئیشە تازەیە تەواو ئەکەین، باش بزانە لە تۆ زۆر بە پەرۆشترم.

دڵنیا: پەرۆشییەکەی من بۆ ئەوەیە ئیتر جێگیر بین و هەموو کاتێ بەیەکەوە بین.. ئەی ئیشی تازەش ئاوا کورتخایەن ئەبێ؟

سەرچڵ: هەر زۆر کورتتریش.. وەک وتم زۆر ئاسانە وەک باسی ئەکەن.. سەفەرێکە بۆ سەر سنورو ئەگەڕێیتەوە، ئیتر ئەوان بۆت دیاریی ئەکەن ئەو شتە چۆن ئەهێنیتەوەو ئەگەیەنیتە دەستیان.

دڵنیا: هەڵبەت قاچاخە؟

سەرچڵ: ئەی ئەو هەموو پارەیە چۆن بۆ شتی ئاسایی ئەدەن بە من و تۆ؟

دڵنیا: کێشەم نییە، مادام تۆ لەگەڵمای بۆ جەهەنەمیش بێ چش.

سەرچڵ: منیش داوای ئەوەم کرد لەگەڵتا بم، وتم ئەو هەموو ژیانمە بە تەنها نایێرم نەک شتێکی بەسەر بێت، کەچی ڕازیی نەبوون، وتیان ئیشەکە ئیشی کچانەو خۆمان ڕێکمان خستووە، پیاوی تیا نابێ.

دڵنیا: ئۆو، کە ناخۆش بوو. بە تەنها زۆر ناخۆشە.

سەرچڵ: بەڵام دەسکەوتەکەشی خەیاڵییە، بە پارەی کارگەکەشەوە تا ئێستا چاومان بە پارەی وا قەبە نەکەوتووە.

دڵنیا: واو بەوجۆرەی تۆ ئەیڵێی ئیتر پێویستیمان بە هیچ شتێک نامێنێ؟

سەرچڵ: کچێ پێویستیی چی؟ یەکسەر ڤێللاو سەیارەی دوامۆدێل و هەرچیەکمان بوێ ئەیکەین.

دڵنیا(( خۆشیی زۆر)): ئەوە بەڕاستتە سەرچڵ گیان؟

سەرچڵ: ئەوەی ئەیڵێن ئاوایە جارێ، با لەگەڵیانا ڕێک بکەوم باشتریش بێ، یان خوانەخواست درۆ دەربچێ.

دڵنیا: نا توخوا وا بکە ببێ.. دەمێکە خەو بەوەوە ئەبینم دەوڵەمەند بم.

سەرچڵ: ئەوەی ئەوان ئەیڵێن، ئەتکا بە ملیاردێریش.. ئەترسم دوایی نەمناسیتەوەو بڵێی وابزانم تۆم لە شوێنێک بینیوە؟ هههههە

دڵنیا: ئەوە بە ڕاستتە سەرچڵ؟ من سەرو دڵ و ڕوحیشم هی خۆتە.. ماڵی دنیا چییە؟ ئەوەی ئەمەوێ هەمبێ، بە ڕاستیی بۆ دڵخۆشکردنی تۆیەو ژیانی بەختەوەری هەردووکمان.

Cut

دیمەنی – ١٣٤٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ڕەمزی))

ڕەمزی: ئا.. هەر ئاماری داهاتی دوو مانگ لەمەوبەری کارگەم بۆ وەرگرەو بە ناوی ئیشی وەهمییەوە ئەو بڕەو کەمێک زیاتریان بۆ بخەرە قاسەکەوە.

شەنیا(( پێکەنین)): هەهە بە حساب ئیشی ئەم مانگەمان باشتر بووە.

ڕەمزی: نیگار حەزی لە پارەیە بۆی دانێ.

شەنیا: ئەی تۆ چی ئەکەی؟

ڕەمزی: ئەچم بۆ لای دیدەوان و نەجاتی ئەدەم، با ئیش کەڵەکە نەبێ.

شەنیا: هەهە چەند خوێن ساردی، ئەوەم فێرکەو هیچیتر.

ڕەمزی: تۆش کەم نیت! داهێنانی تیا ئەکەی، شەوێ خۆت وتت.

شەنیا: بەخوا بۆ نارەوەن و ئامۆ، ئەوەنە خوێنگەرمانە لەناویان ئەبەم، بیرت لێ نەکردبێتەوە.

ڕەمزی: ئەها من ساردو تۆ گەرم؟

شەنیا(( سوعبەت توڕە بوون)): ئامازە مەنێرە، بێدەنگ بە، تۆ کاکی منی، ئەوە ڕێککەوتنی سەرەتامان بووە.

ڕەمزی: باشە من ئەڕۆم.. بەڵام ئەوەش بزانە لێرە بەرژەوەندیی ئێستاییمان هەیە، ڕێککەوتنی پێشوو بە تاڵ ئەکاتەوە.

شەنیا: یانی پراگماتیانە؟!

ڕەمزی: عاف فەرین.

شەنیا: من کەری خۆم بەستۆتەوە هەههەه.

ڕەمزی: دەی تا ئێمەشت کەر نەکردووە بای.

شەنیا: نا حەددم نییە تۆ برا گەورەکەمی و ئێمە هەموو لەژێر فەرمانتاین.

(( ڕۆشتنی ڕەمزی))

**<u>شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە(( دەست بەو لایەی ڕومەتیا ئەهێنێ کە ڕەمزی پیا کێشا:</u>**

شەنیا: تۆ بڵێی لە کەلێکی ئەوەندە بەرزا بی دەستم نەتگاتێ ڕەمزی.. (( بە فلاشباک ئەو زللەیەی ڕەمزی لێیدا)) من بەڵێنم پێداوی لە خوێنەکەتا سەما بکەم، ئەوەش بەرژەوەندیی ئێستایی و داهاتوویی و هەموو کاتەکانی منە.. پەلەت نەبێ و منیش پەلەت لێ ناکەم.. بڕۆ دیدەوانیش نەجات بە، وەک خۆت ئەڵێی، بزانین ئەو بەختەوەرە کێ ئەبێ تۆ نەجات ئەدا.. بەڵام بۆ نا؟ ئای ی ی (( وەک شتێکی بیرچووبێ و فکرەی بۆ هاتبێێ))

**<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:</u>**

Cut

دیمەنی – ١٣٤٦ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( چایخانەکە گوێزراوەتەوە بۆ تەنیشتی پایەی لایەکی ئۆفیسی وەکالەت.. کارە عەرەبانەی حەماڵییەکەی پێ نییەو دانیشتووە.. هاوڕێ چا تێ ئەکاو هەندرێنیش دانیشتووە، سەفین لەلایەکەوە ئەڕوا بارێکی بە شانەوەو عەبە بە ڕاکردن ئەڕوا بۆ ئەو شوێنەی سەفین لێیەوە هات.))

کارە: دەی خێراکە باوکەکەی باوکم، ڕاکە.

هەندرێن: ئەوە چییە مامە کاروان؟ ئەڵێی خۆت ئیش ناکەی؟

هاوڕێ: ئای برا، خوا کاک حەمە خدری بۆ ئەم ناردووەو بۆی بۆتە خێرو بەرەکەت.

کارە: جا توخوا ئیشەکە خۆشترە یان ئەم دانیشتنە؟

هەندرێن: بۆ پێی وتووی ئیش مەکە؟

کارە: پێی وتم ئا ئەلێرە ناجوڵێیت و سەرپەرشتی حەماڵەکانم بۆ ئەکەیت و هەر کەسێکیان ملیان باش نەدا بۆ ئیش دەری ئەکەم.

هاوڕێ: ئەی ئاگات لێ نییە چۆن کردوونی بە فرفرۆکە؟ هەر دێن و ئەچن.

هەدرێن: ئەڵێم خوایە بۆ ئەمرۆ ئیش باش ئەڕوا، تومەس کاک حەمەخدر بەرنامەی بۆ داناون، ئەک دەستی خۆش.. وەڵا باوکم عەیبتان نییە ئەمڕۆ.

هاوڕێ: دەی ئەوە بەمەرجێ کارەش ئیش ناکا، ڕۆژانیتر چوار بوون و ئیشیش بەڕێوە نەئەچوو.

(( دڵە ئەگەڕێتەوە بە ڕاکردن و لە ڕێ پێڵاوەکانی لە پاژنەوە توند ئەکاتەوە))

کارە: کورە ئەوە چییەکەی هۆو؟ ڕاکە با ناوت نەنوسم.

(( پێکەنینی هاوڕێ و هەندرێن.. تریفە سەری لە دەرگاوە ئەهێنێتە دەرەوە))

تریفە(( بزە)): توخوا بێ زەحمەت کەمێ سوک.. ________ Cut ______________

دیمەنی – ١٣٤٧ – ڕ/ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( زاهید وەستاوە بە دەمامکەوەو دیدەوان چاوی بە توندیی هەڵئەگڵۆفێ))

دیدەوان: زەحمەت نەبێ شتێک چۆتە چاومەوە، ئەگەر پیاڵەیەک ئاوم بدەیتێ، یان فویەکی پیاکەی، ممنون ئەبم.

زاهید: پێڵووت بگرەو بیخەرە سەر ژێر چاوت بۆ ماوەی یەک دەقە، هەرچی تیابێ دەرئەچێ.. ئیتر نە ئاوی ئەوێ و نە فوو.

دیدەوان (( ئەوە ئەکات و پاش کەمێک)): وەڵاهی هیچ فەرقی نەکرد، کاکە ئێمە کۆنین هەر شتە کۆنەکانی خۆمان ئەزانین، تکایە هاوکاریم بکە.

زاهید (( دێتە پێشەوە)): دەی بە سەری تۆ بزماریشی تیابێ بەوە دێتە دەرەوە.. (( لێی دێتە پێشەوە)) ئادەی چاوت بکەرەوە!

دیدەوان (( دەست ئەبا بۆ چاوی بیکاتەوەو کە زاهید دێتە پێشەوە، پەلاماری دەمامکەکەی ئەدات و لای ئەبات)): زاهید !!!!!!!!!! (( زاهید بە پەلە ئەچێتەوە دواوە)) یەعنی کوڕی نارەوەن ئاگای لە هیچ نییەو هەر خۆتان ئەتانەوێ ئەوان توشکەن؟ ئەمە لەو ڕۆژەوە ئەزانم کە خۆت نەبان کردو وتت ڕەمزی و ڕەوەز ناناسم.. کەرە خۆ من وەک ئێوە گەوج نییم.

زاهید: من بڵێم چی فەرمانە.

دیدەوان: فەرمانی چ خوێڕییەکتانە، دە ڕۆژە منتان خستۆتە ئەم ئازارو دڵەڕاوکێیەوە؟ ڕەمزی؟

(( زاهید بە پەلە ئەچێتە دەرەوەو دەرگا دائەخاتەوە.. دیدەوان ئەچێ دەرگا بکاتەوە بۆی ناکرێتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٣٤٨ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( نیناو ئاوا ))

ئاوا: با با ئێستا بچۆ خۆم لێرەم، دوای دەوام لە ماڵەوە بی باشترە، ناتوانم ئاگام لێت بێ.

نینا: دامنابوو عەسر بیبینم، بەڵام بە قسەی تۆ ئەکەم، با خۆت ئاگاداری چوون و هاتنەوەم بیت.

ئاوا: دە تەلەفونی بۆ بکەو لەمناوە لە شوێنیک بیبینە.

نینا: هەر زۆر باشە، لەو قاوەخانەکەی سەر جادەکەی تەنیشتمان ئەیبینم، با نزیک بێ و تۆش عەزێت نەکێشی، هەر خۆم بە پێ ئەچم (( بەسەر ئاماژە ئەکا ))ئەوەتا.

ئاوا: هەر زۆریش باشە.

(( نینا کاغەزێک دەرئەهێنێ و لە مۆبایلەکەیا لەسەر کاغەزەکە ژمارەکە ئەنوسێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٣٤٩ – ڕ / ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان دانیشتووە، دەرگا ئەکرێتەوەو ڕەمزی بە دەمانچەیەکی ڕووت بە دەستییەوە بە بێ دەمامک دێتە ژوورەوە ))

دیدەوان: ئەوە چییە بەدەستتەوە ڕەمزی ناموبارەک؟ بۆ فڕاندوومت؟

ڕەمزی: دانیشە دیدەوان ورتەت لە دەمەوە نەیەت (( تورە )) ئەڵێم دانیشە.

دیدەوان (( ئەگەرێتەوەو دائەنیشێ )): لەوە ناچێ نیازت باش بێ ڕەمزی؟!

ڕەمزی: ئەوە هی ئێستا نییە ئەو نیاز خراپییەم، هی پانزەساڵەو دەرفەتم بۆ هەڵنەکەوتووە.. تۆ دەبەنگ بووی هەستت پێ نەکردووە.

دیدەوان: ئۆو، مانای وایە لە سەردەمی دارەوانەوە؟!

ڕەمزی: ئەویش زۆر بەدواتا گەڕا، بەڵام خۆت شاردەوە، پێتزانی بە نیازی چییە.. بەڵام پیریی نیازی منی لێشێواندی و متمانەت پێکردم.

دیدەوان: لەوەتای تۆ ئەناسم جێی متمانەی من نەبوویت.. ئەم دەرفەتە بۆ منیش هەڵکەوتایە بە هەدەرم نەئەدا.. گوناحە لە دەست خۆتی بدەی.

ڕەمزی: نا ئەوەندە گەوج نیم لە دەستخۆمی بدەم، دڵنیابە.. من ماوەیەکی زۆر زۆرە ئەم داوە ئەچنم و بەناوی ئەوەوە کە گێلیت و بڕیاری خراپ ئەدەیت و گروپەکە تێک ئەدەیت، قەناعەتم بەو مناڵ و مەزمەی لای خۆم کردو هەموو بە یەک دەنگ بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرکردیت و منیش ئەرکی سەرۆک کوشتنم خستە ئەستۆی خۆم.

دیدەوان: منیش هەر لە چنینی داوێکی وایا بووم بۆ تۆ، بەڵام تۆ وریاتر بوویت، ئەم فڕاندنە ئیشەکەی بۆ ئاسانتر کردی.

ڕەمزی: ئەی چۆن؟ ئەبێ بەرنامەی خێرات هەبێ.. بەڵام لە ڕاستیا کوشتنت لەبەر هیچ یەکێک لەو هۆیانە نییە کە قەناعەتم بەوان پێکرد.

دیدەوان: هەر ڕقی کۆنە.

ڕەمزی: نا دیدەوان، ڕق چییە؟ ئەتوانی تیبپەڕێنی.. وەک خۆشەویستی وایە.. ئەوانە ماوەیەکەو بەسەر ئەچێ.. پێت بڵێم بۆ بەدەستی خۆم ئەتکوژم؟

((دیدەوان خەندەی گاڵتەجاڕیی))

ڕەمزی: ئەوە دوا خەندەت بوو لە ژیانا؟

دیدەوان: نازانم.. ڕەنگە دوایەمین بێ.. خۆ لەو بڕوایەدا نیت یەکەمین خەندە بێ بە ڕووی ژیانا؟

ڕەمزی: من یادەوەرییەکی پێش پانزە ساڵ لەمەوبەرت بیر ئەخەمەوە، کاتێ بۆ یەکەمینجار بوو تۆی تیا ببینم.. ئەزانی لەکوێ؟ ... لە باخەکەی کاک دارەوانا ئەتانخواردەوەو منیش هاتم وەک خزمەتکار سەیرت کردم، نەتئەزانی من و کاک دارەوان وەکو یەک بیرمان ئەکردەوەو لەو کاتەیا!! بە نیازی لەناوبردنت بووین.. بەداخەوە ئەو نەیبینی و زۆری خایاند.. بۆیە کوشتنەکەت پێشکەش ئەکەم بەو.

دیدەوان: یادەوەرییەکە ئەوەندە گرنگە باسی بکەی؟ یان ئیشەکە تەواو ئەکەی؟

ڕەمزی: گرنگە.. بۆ ئەوەی لە گۆڕەکەشا لە گەڵتا بێ.

**بۆ فلاشباک:**

———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٣٥٠ – فلاشباک – ڕ – عەسر / د – باخی ڤێللاکەی دارەوان:

(( دارەوان و دیدەوان ئەخۆنەوە.. گرژن.. ڕەمزی بە جلی کوردییەوە لە لای ڕاستی دارەوانەوە کەمێ دوور وەستاوە، وابێ گوێی لە قسە بێ.. هەرسێکیان گەنجترن))

دیدەوان: دارەوان بۆ دواجار ئاگادارت ئەکەمەوە، من لەو خەڵکانە نیم پەنجا جار قسەیەک بکەم و بەقسەم نەکرابێ.. چۆن کردتم بە خاوەنی سەروەت و سامان و ژن و ،ماڵ و دەسەڵاتی کوشتن، هەرواش لە لەیەک چرکەیا ئەتوانم هەموویت لێوەرگرمەوە.. بیرتە کە ژنەکەیان نەدایتێ چۆن ئەگریای بەسەرماو سەری دنیات لێهاتبۆوە یەک؟

دارەوان: بەڵێ گەورەم هەرچیم هەیە لەسای سەری جەنابتەوەیە، نکوڵیی ناکەم.. بەڵام کە خۆم لە کوشتنی ڕەفعەت نادەم، بە بێ ئەمریی کردنی مەزانە تکایە.. باوەڕم پێ بکە لە توانای گروپەکەدا نییە.

دیدەوان: جا هەر بۆ یەکجاریی خۆت ڕێ و شوێنمان بۆ دانانێیت و پێمان بڵێ چی بکەین و چی نەکەین نادارەوان؟ وا پێت لێ ڕاکێشاوە، خۆتت بە تەواوەتیی بیرچۆتەوە.. (( ئاماژە بۆ ڕەمزی ئەکا)) ئا ئێستا بەو گەنجە بڵێم بەیانی زووتر نییە بێ دەمەدەم کردن ئەیکوژێ.. وریای زمانت بە دارەوان بە بڕین نەچێ.. من ئامادەم بۆ تا هەتایە لە بنا بۆت ببڕم.

دارەوان: فەرمانتە گەورەم. بە قسەت ئەکەم.

دیدەوان(( هەڵئەسێ)): من سبەی ئێوارە ئەچم بۆ مزگەوتە تازەکەی لای ماڵی ڕەفعەتەوە بزانم شوێنی پرسەکەیان باشە؟

دارەوان: ئەی بۆ من نەچم بۆت سەیر بکەم گەورەم؟

دیدەوان: گەمژەی لە هیچ تێنەگەییو! مەبەستم پرسەکەی ڕەفعەتە، سبەی ئێوارە بۆی بچم.

دارەوان: جێبەجێ ئەکرێ گەورەم، بەسەرچاو.

(( دیدەوان بە بێ خواحافیزیی ئەڕوا))

ڕەمزی: گەورەم ئەو هەموو ناماقووڵییە چی بوو، ئەو کابرا خڵەفاوە کردی لە ئاستی جەنابتا.. ڕێم بدە بچم یەک فیشەک بنێم بە ناوچەوانییەوە.

دارەوان: ڕەمزی، چەند کەسێکیتر بێنە ڕیزەوەو نامەوێ ئیتر ئەو کابرایە بە بەرچاوی منەوە هەناسەیەکیش بدات.

ڕەمزی: ئێستا بچم سەری پانکەمەوە؟

دارەوان: نا، لێرە نا.. لە شوێنێک بەسەر خۆمانا ساغ نەبێتەوە.

__________ **فلاشباک تەواو** __________ Cut __________________

دیمەنی – ١٣٥١ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٤٩ –ڕ/ن –ژووری سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و ڕەمزی))

ڕەمزی: پاش ئەوەی ماوەیەکی باش بۆتگەڕاین و لە هیچ کونێکەوە دیار نەمای.. کاک دارەوان ڕایسپاردم، کە لە هەر ساڵ و عەوامێکا تۆم بینییەوە، کوشتنت پشت گوێ نەخەم لەبەرئەوەی تۆ دۆستایەتیی نافامیت و خەڵک بە بچوک ئەبینی.

دیدەوان: ئەوەندە بێ ئاگا نەبووم ڕەمزی! زۆر لە نزیکەوە ئاگام لە هەموو باس و خواستێکتان بوو.. خۆ ون کردنم لەسەر ئەو ڕاپۆرتانە بوو ڕێشار ئەیدامێ.

ڕەمزی: هەهە هەر زوو ئەمانزانی ڕێشار نییەتی پاک نییە لەگەڵ کاک دارەواناو من نەمهێشت بمناسێ، بەڵام کەسێکمان دەست نەئەکەوت لەبری ئەو.. بەهەرحاڵ ئەوە ئەو ڕۆژە هاتە پێش و تۆم لە پەڕی تۆز لێنیشتووی زەمانە دەرهێنایەوە بۆ کوشتنت.. ئەمڕۆ وەسێتەکەی کاک دارەوان بەدی ئەهێنم.

(( بە بێ ئەوەی ڕەمزی پێ بزانێ لە پشتەوە شەنیاو سەرچڵ و ڕەوەزو زاهید دێنە ژوورەوەو دیدەوان چاو هەڵئەبڕێت، بزەیەک بۆ ڕەمزی ئەکا))

دیدەوان: هەر کەسێک بۆی هەیە دوو دەرفەت وەرگرێ بۆ گەیشتن بە خەونێک.. کەوابێ پێش دەرفەتی سێیەم ئەبێ بکوژێتەوە.

ڕەمزی: زۆر ڕاستە، دەرفەتی سێیەم هەر بوونی نییە.. من ئەم دەرفەتە بە تەواوەتیی ئەقۆزمەوەو دوای کاک دارەوان ئەبێ من سەرۆک بم نەک تۆ.

دیدەوان: کەوابێ لە دەرفەتی دووەما ئەکوژێیتەوە ڕەمزی، زۆر ڕاستە سێیەم بوونی نییە.. (( بزە )) ئەی ئەگەر نەبووی بە سەرۆک ڕەمزی؟

ڕەمزی(( بە چیچکانەوەو دەمانچەکە ڕوو لە دیدەوان، دائەنیشێ)): بەڵام بووم.

(( لە سەروو سەری هەردووکیانەوە زاهیدو شەنیاو سەرچڵ و ڕەوەز نیشان ئەدرێ، بە ئاراستەی ئەوان تەقە ئەکەن))

دیمەنی – ١٣٥٢ – ڕ / ن – قاوەخانە:

(( نینا دێتە قاوەخانەکەوەو شەپۆل بە خێرایی بەرەوپیری ئەچێت.. بە شێوەیەک پێش خۆی ئەدات لە پێشەوە وا دەربکەوێ دەستی بە پشتیەوەیەتی، بەڵام دەستی بەر پشتی نینا ناکەوێت، لە دانیشتندا کورسیی بۆ ڕائەکێشێت تا دائەنیشێت، ئەوسا خۆی دائەنیشێت، بە ئاماژەی دەست و دانیشتن و سەیر کردن، عاشقانە نمایش ئەکا.. دوای بەخێرهاتن))

شەپۆل: ئەمشەو چووم بۆ ماڵی باوکم باسمکردی.. هەر مەپرسە چەندیان پێخۆش بوو، ئەیانویست ئەمڕۆ بێن، من وتم با ئەو ئیشانە یەکلا بکەینەوە، ئەیانهێنم خۆی و مێردەکەشی.

نینا: جا بۆ نەتهێنان؟ خۆزگە بمبینینایە زۆرم پێ خۆش ئەبوو.. ئەی توخوا وەزعیان چۆنە؟

شەپۆل: زۆر باشن بەقوربان، ڕێزو سڵاویان هەبوو.

نینا: توخوا تۆش زۆر ئەحواڵت بپرسینایە.

شەپۆل: زۆر سوپاس.. جا با بێینە سەر باسەکە بە خێرایی نینا گیان..خۆشم مێردم و پێمخۆش نییە ژنەکەم بێ پرس بچێ بۆ شوێنێک نەزانم کوێیەو لەگەڵ کێ دائەنیشێ.

نینا(( پێکەنین)): زۆر لەسەر ئەو مەسەلەیە قسە ئەکەی کاکە شەپۆل، وا دیارە زۆر دڵپیس بی هەهە.

شەپۆل: وەک دڵپیسیی نا، هەرچەندە ئەوەش بێ ناهەقم نییە، ڕۆژگارەکە ئەوەندە پیسە، لەو پیسییەی خۆی بەشی دڵیش ئەدات.. بەڵام من ئەمەوێ چۆن خۆم ئەپارێزم و نامەوێ توشی قسەو سەرئێشە بم، ئاوا تۆش بپارێزم.

نینا: سوپاس، چاکەی خۆتە.

شەپۆل(( بەدەم دەرهێنانی دوو کاغەزەوە)): نا.. هیچم نەکردووە.. دادە گیان شتەکان زۆریان شڕکەو پڕکەن و بۆم کۆ نەئەکرایەوە.. جارێ ئەم دوو ڕێککەوتنەکەم هێناوە،

بزانە ناوی سیانیی باوکتەو ئەوەش ئیمزای خۆیەتی؟ چونکە هەر بیرم نەبوو ناوی سیانیی باوکت بپرسم.

نینا(( تەماشایان ئەکاو بزە ئەیگرێ)): بەڵێ ئەرەوەڵا زۆر تەواوە، ئیمزاکەش ئیمزای خۆیەتی.. بەڵام قەت باسی ئەم قەیسەریی و خانووەی نەکردووە.. پارەیەکی زۆرە چۆن لێی شاردووینەتەوە؟ ئەزانی باوەڕم بە چاوی خۆم نەئەکرد؟

شەپۆل: ئەم دووانەیان بڕێکی زۆر کەمە لەو سامانەی بۆیان جێهێشتووین، تۆ چانست هەبوو، دەست پیاوی ئەمین کەوت، خۆت ئەزانی، کەس پارەی وا بۆ کەس ناگێڕێتەوە.. جا پێشت سەیر نەبێ، هەمووی بە ناوی باوکیشمەوە تۆمار کراون، تەنها بەم ڕێککەوتن و بەڵێننامانەی دادنوس، ئەبێتەوە بەماڵی تۆ.

نینا: ئەوەندە سەرسامم کاکە شەپۆل نازانم بڵێم چی و بە چ زمانێک سوپاست بکەم؟.. بە ڕاستی ئەمە بە سوپاسکردن کۆتایی نایەت، تۆ سەلماندت لە برا نزیکتری بۆ من. هەر نازانم بڵێم چی.

شەپۆل: هەر سوپاسیشی ناوێ.. منیش چاوم لەدوای ماڵی کەس نییەو بە تایبەت هی ئێوە، ئەوە هەر هیچ.. ئەوەی خۆم پەیام کردووەو باوکم بۆی جێهێشتووین، سەرو زیادە.. دەی خێرا شتێک داواکەو با بچینە ماڵەوە، ئەوانیترو کومپیالەو کچێ زۆر شتیترە، با هەمووی ببینی، و یەکلایانکەینەوە.. ئەوسا ئەبێ کاک ئاواش بناسم و تۆش بێیتە ماڵی باوکم و ئیتر نزیکایەتیمان ئەپدەیت بکەینەوە.

نینا(( ئیحراج)): وەڵا ڕاستییەکەی کاکە شەپۆل بۆ ئەم دانیشتنە بە ئاوام وت و لاریی نەبوو.

شەپۆل: پەیمانشکێنییت کرد خوشکەکەم.

نینا: دەی وەک خۆت وتت ئەویش مێردەو ئەبێ ئاگای لە هەنگاوەکانی ژنەکەی بێ، وەک چۆن منیش ئاگام لەوە.. ببورە با تەلەفونێکی بۆ بکەم و تێی بگەیەنم، کە ئاساییە بێم بۆ ماڵیشتان.

شەپۆل: تکایە توشیی ڕووگیرییم مەکە، وا ئەوە وتی منیش دێم، باوەڕ بکە ڕەنگە نەتوانم هەنگاو هەڵێنم.. نینا گیان تۆ وەکو خوشکیت بۆ من، بەڵام توخوا با ئەوەیان بکەوێتە کاتێکیتر.

نینا(( تکا کردن)): نا تکایە، نەک زۆرمان پێ بچێ.

شەپۆل: نا نا نا.. دڵنیابە زۆرمان پێ ناچێ، زۆر زوو ئەگەڕێینەوە.. باوکم هەموو شتەکان تۆ بیبەو لەگەڵ مێردەکەتا پێکەوە ساغیکەنەوە.. ئەوەشت لەگەڵ ئەکەم باشە؟

نینا: نا نا چۆن شتی وا ئەکەم، ئەوەماڵی تۆیە.

شەپۆل: جا بۆ نا؟ ئەوە ماڵی هەردوولامانە، وەک لای من بووە، با لای تۆش بێ.. گرنگ ئەوەیە دادپەروەرانە هەردووکمان بگەین بەوەی بۆمان دیاریکراوە.. من متمانەی دنیام بە تۆیە نینا گیان، ئەوە چییە؟ هەرچیم هەیەو نییە ئەیخەمە بەرپێت.

نینا(( هەر احراجە)): زۆر سوپاس کاکە شەپۆل گیان، بەس بەخوا زۆر قورسە بێ پرسی ئەو بێم.

شەپۆل: تکایە ئەوە بکە لەبەر من.. ئەوەنەم پێ ڕەوا نابینی؟

نینا: زۆر زیاتریش ئەوە تۆ باسی چی ئەکەی؟ بەڵام..........

شەپۆل: پێویست بە دوودڵیی ناکا، هەستەو هیچ بانگ ناکەین، با دوا نەکەوین.. لەوێش بە پەلە شتەکانت بۆ ئەپێچمەوەو یەکسەر دێینەوە.

نینا(( تەماشای سەعات ئەکا)): بە بیست دەقە کۆتایی دێت؟

شەپۆل: ڕاستگۆ بم لە گەڵتا ئەوپەڕی نیو سەعات.

نینا(( خەندە)): دەی بڵێم چی؟ دڵی تۆم پێ ناشکێ.. (( تورەی سوعبەت)) بەس داواجار بێ داوای وام لێ بکەی.

شەپۆل: بەڵێن بێ.

(( هەڵئەسن و ئامازە عاشقانەکانی شەپۆل بەردەوامە و دەست خستنە پشت بێ ئەوەی بەر پشتی نینا بکەوێ، تا لە قاوەخانەکە ئەچنە دەرەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٣٥٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن و تریفە))

نارەوەن: کاکە من تەحەمولی ئەو معەسکەرەی بەردەرگام نییە دووریان خەرەوە، لەبەر من نا.. لەبەر خاتری تریفە، خۆ مەگەر سەرێ نەکێشێ بەو دیوا، ئەچنە چاویەوە.

خدر: تکایە نارەخان، ئەوە ئیشی منەو هەڵبەت هۆکارێکی هەیە.. قسەی تیامەکە بە یارمەتیت، ئەتوانی بەس تەحەمولی بکەیت و هیچیتر؟ هههههه.

تریفە: وەڵا خۆ هیچ پەیوەندییان بە ئێمەوە نییە، چی تیایە دایکە با هەر لەوێ بن، بۆ خۆت باشترە، تۆ چاخۆری، چاکەت نزیکتر بۆوە هههه.

نارەوەن: جا من جیا بە جیا دەرەقەتتان نەئەهاتم، ئینجا ببن بە دوو؟ (( دەنگی بەرز)) ئا هاوڕێ چایەک بێنە!

(( پێکەنینی هەرسێکیان))

خدر: ئافەرین دەستخۆش، ئاوا !!!!!

هاوڕێ (( سەر ئەکێشێتە ژوورەوە)): داوای چات کرد نارەوەن خان؟ هەر یەک چا؟

Cut

دیمەنی – ١٣٥٤ – ڕ/ د – حەوشەی سجنی دیدەوان:

(( ڕەوەز تێل ئەکا.. شەنیا و سەرچڵ دەرئەکەون لە حەوشەکەدا سەرقاڵن یان ئەوانیش تێل ئەکەن))

ڕەوەز: ئا ئا.. شەو خۆتان وەرن لە حەوشەکەیا بۆتان فڕێ ئەدەین، لە شوێنێکی وا بیشارنەوە نزیکی شار بێت، با قاچیشی بەدەرەوە بێ خەڵک بیبینێ............ (( تورە)) ئەرێ کەی پارەت خوراوە سەرسەرییی؟ کە بینیتم تۆڵەی ئەو جارەی تریشت بۆ ئەکەمەوە خەمی پارەت نەبێ............ دەی باشە، بە وریایی بیبەن.

(( مۆبایل دائەخاتەوەو ئەچێتە لای شەنیاوە لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ١٣٥٥ – ڕ / د – بەر دەرگای ماڵی شەپۆل:

(( شەپۆل شۆفێرە نینا لە تەنیشتییەوە.. سەیارەکە ئەگاتە بەردەمی ماڵەکە ئەوەستێت.. سەیارەیەکیتر کەمێک لەولاتر نیشان ئەدرێت.. شەپۆل دائەبەزێت و نینا لەناو سەیارەکەوە، شەپۆل ئەچێتە بەردەمی و دەرگای بۆ ئەکاتەوە دابەزێ))

نینا: دە تۆ بچۆ بیهێنە با دوا نەکەوین، من لێرە ئەبم.

شەپۆل: ئەوە بەڕاستتە بەساقە؟ چۆن شتی وا ئەبێ؟

نینا: بەخوا زۆر ئاساییە بچۆو من چاوەڕێت ئەکەم.

شەپۆل: بۆ مەگەر تۆ لەبەر ماڵی کێیا وەستاوی تا لێتگەڕێ لەبەردەرگا بی؟ ماڵی برای خۆتە نینا گیان.. شتەکان پەرتەوازەن خۆ ئەبێ کۆیکەمەوەو بتدەمێ(( باڵی ئەگرێ و بە هێمنی)) دەی فەرمووە فەرموو.

نینا: باشە تکایە بە پەلە کۆیان بکەرەوە.

شەپۆل: هەر ئەوەندەی شەربەتێک یان ئاوێک ئەخۆیتەوە، بەڵێنم پێدای زوو بتبەمەوە. (( شەپۆل ئەچێتە لای دەرگاکەوە، کلیل دەرئەهێنێت دەرگای دەرەوە بکاتەوە..))

نینا: ئەڵێی کەسیشی لێ نییە؟

شەپۆل: نا لەوێ نییە، لە دائیرەیە.. جا ئەو لەوێ بووایە چۆن ئەموێرا بەو هەموو جوانیەتەوە بتهێنمەوە.. دەستم بایە بە پەڕەی قورئانا باوەڕی پێ نەئەکردم کە وەک خوشکم وای. هەهە.

نینا: سوپاس.. بەڵام دواتر کە هەموو تێکەڵ بووین خۆی تێ ئەگا.. ڕاست ئەکەی.

شەپۆل(( دەرگا ئەکاتەوە)): فەرموو پێشکەوە، لای ئێمە پیاو پێشی ژن ناکەوێ.

نینا: نا تکایە من شارەزا نینم.

شەپۆل: ئەوە مەحاڵە من پێشکەوم.. فەرموو شارەزایی ناوێ.

نینا: کەمێک عینادیشی هەهە.

شەپۆل: لەو مەسەلانەیا هەر زۆر.

نینا(( دێتە بەردەمی)): لێرەوە.

شەپۆل: بە ڵێ بەڵی هەر لێرەوە ئەوە دەرگای مەدخەلەکەیە. فەرموو.

(( بە هەمان شێوە دەستی لە پشتی نزیک ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بەری بکەوێت و نینا پێی بزانێ.. خۆی زۆر لێ نزیک ئەکاتەوە، تا ئەگەنە دەرگای مەدخەل و شەپۆل ئەیکاتەوەو نینا پێش خۆی ئەخات))

Cut

دیمەنی – ١٣٥٦ – ڕ / د – قاوەخانە:

(( ڕێبوارو تافان))

تافان: نا هەندرێن نایەتە ئەم شوێنانە، بەڵام سەگ و گورگەکەی چواردەوری، لەوان ئەترسم.

ڕێبوار: گوێ مەدەرێ، هەر کامێکیان بشمانبینن بە چاوسوور کردنەوەیەک سایلێنتیان ئەکەم.. دە ئیتر بەسیەتی ترس ترس، نەبڕایەوە؟ لەوتەی هاتووین قسەیەکمان نەکرد لەبەر ترسی تۆ.

تافان: ئاخر بەخوا من فێری ئەم شوێنانە نیم.

ڕێبوار: دەی کەواتە بچینەوە شوقەکەی خۆم.

تافان: گواستتەوە؟

ڕێبوار: نا پێیان وتم لەوێ بە، ئیشمان بەو شوێنەتە.

تافان: دە هەر باسی ئەو شوێنە نەکەی لەبەر ئەو کەللەپووتەی دراوسێت.. بە منیش ئەڵێ بۆلای برادەر هاتووم، کەچی ماڵیشی لەوێیە.

ڕێبوار(( پێکەنین)): هاهاها یەک زەڕڕە ترسی ئەوت نەبێ.. بەیانی پێت ئەڵێم چۆن زمانی بۆ هەتا هەتایە پشیلەکە ئەیخوا.. هههههە.. لە بەیانییەوە حەز ئەکەی بچۆ لە دەرگای بدەو بڵێ خدر بێتاقەت بووم، ئەچم سەرێکی ڕێبوار ئەدەم.. بزانە دەستخۆشیشت لێ ئەکا یان نا؟

تافان: چۆن؟ چۆن شتی وا ئەبێ؟ ناشێ هەڕەشەت لێکردبێ باسی نەکا؟ خۆ ئەوە یەعنی هەر بەیەکجاریی ئەوەت بەسەرا ساغکردوومەتەوە!

ڕێبوار: بەیانی زۆر درەنگ نییە ئەوە بزانی.. ئەوسا بزانە چیت بۆ کراوە بێ ئەوەی خۆشت داوای بکەی؟.. ئەی خۆ گاڵتە نییە تافە گیان؟ تۆ ئەبێ بزانی لەگەڵ کێیا ئیش ئەکەیت و چۆن لە خۆت زیاتر ئەتپارێزن!؟

تافان: جا وەلا وابێ ئیتر هەر لە شوقەکە دائەنیشین.

ڕێبوار: زۆر لەوەش باشتر ئەبێ کە چاوەڕوانی ئەکەی.. ئینجا با بێینە سەر ئیش.

تافان: زۆر باشە، وەڵا زۆر دڵت خۆش کردم خوا دڵت خۆشکا.

ڕێبوار: لەم ڕۆژانەیا لەگەڵ چەند کچێکا ئەچن بۆ سەفەرێک.

تافان: ئەی تۆش بۆ نایەی؟ چەند خۆشە پێکەوە بین.

ڕێبوار: منیش لەبەر تۆ زۆر حەز ئەکەم و داواشم کرد، وتیان تەنها بۆ ژنانە.. بە مینی پاسێک ئەچن و دێنەوە.. شتەکە لە شوێنێک وەرئەگرن و ئەیهێننەوە.

تافان: هههه بێ ئەوەی پێی بزانم، ڕێشار گیان زۆری پێ هێناومەتەوە.. یەک زەڕڕە خەمت نەبێ حەز ئەکەی هەر خۆم ئەچم و هەموویتان بۆ ئەهێنمەوە.. هیچی تیایە بۆ من و تۆ؟

ڕێبوار: بەردڵ ئەگرێ، باشە.

تافان: واو کە خۆشە.

Cut

دیمەنی – ١٣٥٧ – ڕ/ن – ماڵی خدر:

(( غەمگین و هەرمێ و باوک.. غەمگین لە کۆتایی تێل کردنایە))

غەمگین(( تێل)): بەسەرچاو کاکە حەمەخدر گیان.. هەر ئێستا دێم.. خوات لەگەڵ، خوا حافیزت بێ.

باوک: غەمە گیان پێی بڵێ باوکت داوا ئەکا بیبەی بۆ ماڵی ناسکەی پورە بەدیع.

غەمگین: بەسەرچاو مامە گیان.(( خەریکی خۆ گۆڕین ئەبێ))

هەرمێ: ئای خوایە کە مەغشوڵە.. ئەوە بۆیە پێی نەئەکرا سەرمان لێ بدا.. بۆ نایخەیتە جوعمە کەمێ دەستی بەتاڵ ئەبێ باوکە؟ باشتر نییە؟

باوک: باشە با جوعمە بێ، بەڵام بەخوا ئەترسم هەر بڵێ نامپەرژێ.. یا خۆم بیرم بچێ.

هەرمێ: ئەوە لەسەر من، بیرت ئەخەمەوەو زۆریشی لێ ئەکەین.

باوک: دەی باش.

غەمگین (( خۆی گۆڕیوەو دەرئەچێ)): دەی من جارێ بە دوعا.

(( خواحافیزیی کردن و ڕۆشتنی غەمگین))

Cut

دیمەنی – ۱۳۵۸ – ڕ / ن ماڵی شەپۆل:

(( بە پەلەپەل شەپۆل ئەوراق کۆ ئەکاتەوەو جیایان ئەکاتەوە، نینا تەماشای سەعاتی سەر دیوارەکە ئەکا ))

نینا: بەخوا زۆر درەنگی کرد کاکە شەپۆل!

شەپۆل: ئەها ئەهـ دایکەکەمی هەر ئەم یەک دووەم ماوە، سەیرێکیان ناکەی؟

نینا: سەیری چی بەساقەوبم، من ئەڵێی بەسەر ئاگرەوەم.

شەپۆل: دەی ئەهاااااا ئەوە تەواو (( فایلێک ڕێک ئەخات و ئەیدەداتە دەستی نیناوە )) فەرموو ئەوە تەواو.

نینا (( بە پەلە ئەیخاتە جانتاکەیەوەو هەڵئەسێ )): دەی کاکە با بڕۆین. زۆر درەنگە.

شەپۆل: هەر ئاوێک ئەکەم بە دەست و دەموچاوماو ئەڕۆین.

نینا: ئەرێ کەی وەختی دەموچاو شتنە، بۆ چی بە دەستتەوەیە ئەیشۆی؟

شەپۆل (( ناهێڵێ دەستی بەر جلەکانی بکەوێ، وەک پیس بێ و لە خۆی دوور بخاتەوەو نیشانی بدا )): ئەی هەمووی کاغزە کۆنە، ئەزانی چەند میکرۆبی پێوەیە؟

نینا: ئای خوایە لە ناسکیی تۆش.. توخوا کاتی ناسکیی نییە با بڕۆین.

شەپۆل: هەر یەک دەقەم پێ ئەچێ.

(( شەپۆل ئەڕوات و نینا قەلەقە.. کە دێتەوە پێشی قژیشی تەڕەو دەستی پیا ئەهێنێ ))

نینا: چییە ئەڵێی سەریشت بە ملا شت؟ هەهە.

شەپۆل: نا هەر پێشی قژم تەڕ کرد، تۆزی بەرکەوتووە.. دەی با بڕۆین.

(( دێنە دەرەوە )) ________ تابع ________ Cut ____________________

دیمەنی – ١٣٥٩- متبوع – ڕ / د – حەوشەو بەر دەرگای ماڵی شەپۆل:

(( شەپۆل دەرگای مەدخەل دائەخات و ئەچنە دەرەوە، نینا لە پێشەوە ئەڕوا.. شەپۆل لە پشتەوەو دەستهێنان بە قژو سەرو چاوی خۆیاو ئامازەی ناجۆر.. ))

نینا: دەرگای دەرەوە داناخەی؟

شەپۆل: نا خۆی دائەخرێ.. فەرموو سەرکەوە، یان بوەستە با دەرگات بۆ بکەمەوە (( بەرەو دەرگای سەکن ئەچێ))

نینا: نا نا کاکە شەپۆل تکایە ئەوە چی ئەکەی توخوا؟ (( دەستی ئەبات و شەپۆل زۆر لێی نزیکە، نینا بە هێمنیی پاڵ بە سنگیەوە ئەنێ دەرگای بۆ نەکاتەوەو ئەویش ئەیکاتەوە، دەستی نینا ئەکەوێتە سەر پشتی شەپۆل و وەک سوپاس و ئیحراج بوون، دوو سێجار بە سووکیی ئەکێشێ بە پشتیا وەک منەتباریی، کە شەپۆل دەرگا ئەکاتەوە زۆر نزیکن لەیەکەوە)) توخوا ئەوە چیت کرد؟ خەجاڵەتم.. جارێکیتر لەگەڵتا سەرناکەوم.

شەپۆل: ئەوە تەنها ڕێسپێکتە نینا گیان چیم کردووە؟ ئەوە ئەرکەو ئەبێ پیاوان وا بکەن.

نینا: زۆر سوپاس (( سەرئەکەوێ))

(( هەردووکیان سەرئەکەون و کەمێک خێرا ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٣٦٠ – ش / ن – ماڵی نارەوەن:

((نارەوەن سەرقاڵی وایت بۆردەکەو هێڵ کێشانە.. تیرۆژو تریفە خۆیان گۆڕیوەو دێنە لای))

تیرۆژ( بزە)): دیارە دیسان کێشەت هەیە.. بەزمەکەیە هھە.

نارەوەن(( ئاوڕ ناداتەوە)): ئێوە بچن بە لای ئیشی خۆتانەوە، واز لە من بێنن.

تیرۆژ: باشە، من شەو نایەمەوە، لای دەوران ئەبم.

نارەوەن: باجو بیرم کەوتەوە بوەستن با منیش خۆم بگۆڕم، ئیشەکەشتان لێ تێکدام.

تریفە: تۆ بۆ دێیت؟

نارەوەن: ئەی جەناب لەوسەرەوە بە چی دێیتەوە؟

تریفە: حەمەخدر وتی خۆم دێم بە شوێنتا ئەتبەمەوە، دایکت نەخەیتە عەزێتەوە.

نارەوەن: ئای خوایە لە حەمەخدر!.. دەی باشە دە بڕۆن با من خەریکی ئیشەکەی خۆم بم.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی تریفەو تیرۆژ))

Cut

دیمەنی – ١٣٦١ – ش / د – سەر ڕێگەیەک:

Mute

(( دوو سێ کەس، مەیتێکیان پێیە بێ ئەوەی سەروچاوی نیشان بدرێ ئەیخەنە چاڵێکی بچووکەوەو تا ئەژنۆی لە چاڵەکە دەرئەهێنن و ئەویتری دائەپۆشن و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٣٦٢ – ش/ن – ماڵی ئاوا:

(( ئاوا دانیشتووەو نینا بە پێوە))

نینا: ئێستا هەمووی ئەهێنم، پێکەوە سەیری ئەکەین، بزانم چیم ئەکەوێ ئاوا گیان.

ئاوا: توخوا تاقەتی حساباتم نییە بەرخە گیان، خۆت سەیریکە، خوا بکا زۆر بێ، بۆت ئەخەمە ئیشێکەوە تا مابین سەرمایەمان بداتێ.

نینا: لەسای سەری تۆوە لە هیچمان کەم نییە، بەڵام با هەر هەبێ، زەرەری نییە هههه.

ئاوا(( هەڵئەسێ)): من ئەچمە دەرەو تا دێمەوە هەمووی جیا بکەرەوە، خۆت زیرەکی.

نینا: باشە گیان تۆ بڕۆ، خوات لەگەڵ، زوو بێیتەوە.

ئاوا: باشە گەورەم ئەمرەکەی هههه.

نینا: حەددم نییە، خوات لەگەڵ.

(( دوای ڕۆشتنی ئاوا، ئەوراقەکان ئەهێنێت و بە خۆشحاڵیی زۆرەوە دەست پێ ئەکا، ئەچێ دەفتەرێک و قەڵەمێکیش ئەهێنێ))

Cut

دیمەنی – ١٣٦٣ – ڕ / ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

بەهێز: ئەرێ ئەبێ بۆ وایان لێکردبێ؟ شوێنی نەماوە فیشەکی بەر نەکەوتبێ.

ئاری: گەورەم ڕەنگە دەستی کردبێتەوە، ئەگینا یەکێ یەکێ بکوژێ وا شڕو وڕی ناکا.

بەهێز: دیارە چەند کەسێک تەقەی لێکردووە، ڕاپۆرتە پزیشکییەکە بێتەوە هەموو شتێک ڕوون ئەبێتەوە.

ئاری: بەڵێ گەورەم، ڕێ و جێی لێکۆڵینەوەشی هەیە.. ناوەکەی ئاسکرایەو شوێنی کارەکەشی بە ئاسانی ئەدۆزرێتەوە.

بەهێز: چاوەڕوانی ڕاپۆرتە پزیشکییەکە ئەکەین و دوای وەرگرتنی داتاکان، بە وردیی دەست بەکار ئەبین.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

بەهێز: لە دۆسییەی سەدو پەنجاو سێدا گەیشتییە کوێ؟

ئاری: گەورەم، ئەردەڵان ماڵی لە گوندەو ژن و منداڵی نییە.. هاتۆتە شار بۆ کاسبی، چونکە لەوێ هیچ دەرامەت و موڵکێکی نەبووە.. لە خانوویەکی بچووکدا ژیاوە.. ماوەیەک بەر لە ئێستا بە ماندوێتییەکی زۆرەوە گەڕاوەتەوە ئەو دوکانەی، کە خۆی کرێیەتی و سەرقفڵانەکەی داوە.. بەڵام دەوروبەرەکەی باوەڕ ناکەن خاوەنی ئەو پارەیە بووبێ.

بەهێز: بۆم بکە بە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل و بۆم بێنە، لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەرا پێکەوە لێکۆڵینەوەی تیا ئەکەین و ڕای خۆمانت ئەدەینێ.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٣٦٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن دانیشتووەو تریفەو خدر بە پێوە))

خدر: ئێمە زوو ئەگەڕێینەوە.. هەر بۆی ئەکڕین و ئەگەڕێینەوە.

نارەوەن: دەبا یەکێ لە کوڕەکانی بۆیان بکڕیایە، یان حەزتان لە پیاسەکەیە لە شەوێوە بەرنامەتان بۆ داناوە؟

خدر: خەسووە ئازیزەکەم ئەگەر ڕێمان لێ ئەگری؟ لە قسەت دەرناچین، بە یەکێ ئەڵێم بیکڕێ و بۆی بەرێ.

تریفە: ڕاستیەکەی بە نیازین نانی نیوەڕۆش پێکەوە بخۆین و دوای ئەوە بێینەوە.. هەهە

نارەوەن(( وەک سەرسام)): حەمەخدر؟؟؟؟؟!!!

خدر(( ئیحراج)): ئەوە درۆی سپیی بوو کردم، تایبەتە، ئەو جۆرە درۆیانە، بەس بۆ خەسوو ئەکرێ.

نارەوەن: دە بڕۆن، هەر خۆتان بە خۆتان بن درۆزنانە!!!

تریفە: ببورە نارە گیان.

نارەوەن: تۆش فێر بووی؟ هەهە.

(( بە خۆشحاڵییەوە ئەڕۆن و نارەوەن سەربادان و پێکەنین و خواحافیزیی.. پاش کەمێک یەکێک دێتە ژوورەوەو تەنها دەنگی ئەبیسترێ))

دیدەوان: سڵاو لە گوڵ.

نارەوەن(( سەر بەرز ئەکاتەوە.. سەرسام و شڵەژاو)): دیدەوااااان!!!!!

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ١٣٦٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( ڕەوەزو شەنیا ))

ڕەوەز: وابوو.. من ڕقێکی زۆر زۆرم لە تۆو زاهیدا بەدی ئەکرد، دوای ئێمەش تۆ هەر نەئەوەستای، تا دەمانچەکەت خاڵیی بۆوە تەقەت لێکرد.

شەنیا: من نازانم چۆن مرۆڤی وا هەڵئەکەوێ.. باوەڕ بکە پیسترین کەسی سەر زەوی بوو، من ئەڵێم بە ئازایەتی تۆو کۆکردنەوەی سەرچڵ و زاهیدو بە ئاشکرا قسە لەگەڵ یەکا کردن لەسەر ڕەمزی بۆگەن، مرۆڤایەتمان لە هەڵەیەکی گەورە پاککردەوە، نەک هەر خۆمان.. ئێوە نەتانئەناسی ڕەوەز! من لێی نزیک بووم ئەمزانی چ پۆخڵەواتێکە!

ڕەوەز: خۆ ڕەمزی و دیدەوان و هیچ سەرۆکێکیتر، بۆ من هیچ جیاوازییەکیان نییەو هەست ئەکەم کەسێک هەیە لە سەروو منەوەو ئیشی پێمە بۆیە ڕێزم لێ ئەگرێ.. بەڵام ڕاستیەکەی من هەر زۆر دەمێکە کاک دیدەوانم پێ قبوڵترە لە هەر کەسێکیتر..

شەنیا: سەرچڵیش گیانیش زوو ڕازی بوو ڕەمزی بکوژین، سوپاستان ئەکەم ئەوەتان لەبەر من و سەرۆک کرد.. ئاخر من زۆرم ناڵاند بەدەستییەوە، باوەڕ بکە ئێستاش بیرم ناچێتەوە، کە لەسەر ئەوەی شتێکم وت و بە دڵی نەبوو (( گرتەی زللەکەی ڕەمزی لە دیمەنی – ١١١٩ – دا، کە لە شەنیایدا لەگەڵ قسەکاندا ئەڕوا )) زللەیەکی لێدام، بە هەموو ژیانم بیرم لەوە نەئەکردەوە زللەی وا توند لە توانای هیچ مرۆڤێکدا هەبێ لە جیهانا.

ڕەوەز: جا هیچ شتێکیش بەقەدەر تۆڵەکردنەوەی توندوتیژتر خۆش نییە.. ئەزانی تۆش ئەوەی کردت وەک سەما وابوو؟

<u>بۆ فلاشباک</u>:

______ گەڕانەوەی هەیە ______________ Cut ______________

دیمەنی – ١٣٦٦ – **فلاشباک** – ڕ / ن - ژووری سجنی دیدەوان:

(( ڕەوەزو شەنیاو سەرچڵ و زاهید تەقە لە ڕەمزی ئەکەن.. شەنیا ئەچێتە سەری و تا فیشەکی پێ نامێنێ تەقەی لێ ئەکاو دواتر دەمانچەکەی فڕێ ئەدات))

دیدەوان: دەستتان خۆش بێ.

(( شەنیا پێڵاو دائەکەنێت و لەناو خوێنە ڕژاوەکەیدا، یەک دووجار بە دەوری خۆیا ئەسوڕێتەوە.. ئەوانیتر بە توندیی چەپڵەی بۆ لێئەدەن))

**<u>فلاشباک تەواو</u>**:

__________ Cut __________

دیمەنی – ١٣٦٧ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٦٥ –ڕ/ن - ئۆفیسی نیگار:

شەنیا: من ئاگام لە دنیا نەمابوو.. بەڕاستیی بۆ من سروتێکی گەورەو پیرۆز بوو، تەنها بەوەی بە پێ خاوسیی بچمە خوێنەکەیەوە.. زۆر دەمێک بوو بەڵێنی ئەوەم بە خۆم دابوو، بەڵێنیشم بەو دابوو لەلای خۆمەوە، کە ئەبێ بە دەستی کەسێک بکوژرێ لە ئەقڵ و پێشبینیی ئەوا نەبێ.. ئەوە بوو وامکرد بە دەستی هەر هەموومان بکوژرێ.. ئەزانی بۆ؟

ڕەوەز: نا.. بە چیدا بزانم؟

شەنیا: چونکە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی ڕامالّی بەدەستی سەرچڵ کوشت، کە نزیکترین هاوڕێ و خۆشەویستترینی بوو.

ڕەوەز: ئەها، ئێستا تێگەیشتم.. کەواتە تۆ لەیەکەمین ڕۆژەوە ئەوەت بە دیدەوان وتووە، کە بە فەرمانی ڕەمزی فڕێنراوە؟

شەنیا: ئەی چۆن؟ لە یەکەمین بینینیەوە.. لەو ڕۆژەوەی کە ڕەمزی بردمی بۆلای.. ئەوە باشترین دەرفەت بوو بۆ من ڕزگارم بێ لە ئازارەکانی ڕەمزی.. ئەو چەند ڕۆژە ئەزانی چەند ماندوو بووم لە نێوان دیدەوان و ئێوەیا؟ ئەبووایە نەهێڵم ڕەمزیش درک بەوە بکا، هەر مردم مردم.

<u>**بۆ فلاشباک**</u>:

Cut

دیمەنی – ١٣٦٨ – **فلاشباک** ڕ/ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( شەنیا لە دەرگا ئەدات و زاهید ئەیکاتەوە.. ڕەمزی و شەنیا دێنە ژوورەوە، سڵاو و وەڵام))

ڕەمزی: من ئەڕۆم زاهید گیان، نیو سەعاتی تر دێمەوە بە شوێن شەنیا گیانا(( دەست ئەخاتە سەرشانی)) دیدەوان نیشانی شەنیا گیان بدە.

شەنیا: سوپاس.

زاهید: ئەمرەکەی قوربان.

(( زاهیدو شەنیا دێنە ژوورەوە))

—————— تابع —————————— Cut ——————————

دیمەنی – ١٣٦٩ – **فلاشباک** ڕ/ن - ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

(( زاهید فەرمووی لێ ئەکا بۆ ژوورەکە))

زاهید (( دوای فەرموو کردن و دانیشتن)): بەڵام ئەبێ خۆمت لەگەڵا بم، بە پیرییەکەیا تێ مەکەوە، زۆرزانی وا نەبۆتەوە.

شەنیا(( بەتەوسەوە)): کورە بابە تۆم بۆچییە؟ هەزاری وا ڕیز بن هەست ناکەم پیاوی لێ بێ.. دەمانچەیەکم بدەرێ و تەواو.

زاهید: ئەی بۆ نەیەم؟

شەنیا: پێویست ناکا.

شەنیا(( زاهید دەمانچەیەکی ئەداتێ)): لە کام ژوورەیە؟

Cut

دیمەنی – ١٣٧٠ – **فلاشباک** ڕ / ن – ژووری سجنی دیدەوان:

(( شەنیا دەرگا ئەکاتەوەو تا دەرگا دائەخاتەوە دەمانچەکەی بە ڕووتی پێیە.. کە دەرگا دائەخا، ئەیخاتە کەمەرییەوە..))

دیدەوان: ها شەنیا گیان، هاتی؟ دەمانچەکەت بۆ لابرد؟

شەنیا (( بە چرپە قسە ئەکا )): دیارە ئەمناسی؟ ئەی چۆن نازانی من وەک باوکی خۆم تەماشای تۆ ئەکەم؟ کەس هەیە دەمانچە لە باوکی هەڵکێشێ؟

دیدەوان: ئەی تۆ کەی منت دیوە؟ تا متمانەی باوکی خۆتم پێ بکەی؟

شەنیا: من تۆم نەدیوە.. بەڵام ئەوی ڕێزی سەرۆکی خۆی نەگرێ، وەک ڕەمزی هیچ و پووچ، ئەوە هەر کەرامەتی نییە.. من بەڵێنی خۆمت بۆ دووپات ئەکەمەوە سەرۆکە خۆشەویست و گەورەکەم، پێم بڵێ چیت بۆ بکەم؟ ئەمرکە!

دیدەوان: ڕەمزی دڵ و دەمی یەک نییە.. بۆ نمونە منی ئەبردە ژووری پشتەوە تا گوێ لە قسەت بگرم لەگەڵ خۆیا.. کەچی لە بەردەمی خۆتا ڕیایی ئەکرد.. هەر واش لە پەنجەرەوە تۆی نیشان داوم.

شەنیا: سەرۆک گیان، زۆر زیاتریش ئەزانم، لەگەڵ هەمووانا پیسە، تەنها خۆی لا مەبەستە.. ئێستا تا نەهاتۆتەوە بە شوێنما، زوو قسە بکە، چیت بۆ بکەم و لێرە ڕزگارتکەم.

دیدەوان: تەنها ئەوەندەم بۆ بکە بە ڕەوەز بڵێ، ڕەمزی بە نیازی شتێکی وا ڕفاندوومی و هیچیتر.

شەنیا: ئەویش لەگەڵ من و تۆیا ئەبێ؟

دیدەوان: گەر هەوڵێک لەگەڵ ئەم زاهیدەو سەرچڵیشا بدەی، باشتر ئەبێ.

شەنیا (( هەڵئەسێ )): خەمت نەبێ، وا بزانە هەموو شتێ مەیسەر بووە.

**<u>فلاشباک تەواو</u>**: ______ Cut ______

دیمەنی – ١٣٧١ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٦٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

شەنیا: سەرچڵ و زاهیدیش خواخوای قسەیەکی منیان بوو.

ڕەوەز: گرنگ ئەوەیە سەرکەوتوو بوویت، بەڵام بەخوا تۆش کەم نییت! هههه..

شەنیا: خۆی ئەیوت من لەسەر زەعامەت و هەندێ شتی قۆڕیتر ئەیکوژممنیشی ئەکرد بە جێگری خۆی هههه.

ڕەوەز: منیش هەر وای بۆ چووم لەسەر زەعامەت ئەیویست بیکوژێ ئافەرین.. بیانووەکانی زۆر لاواز بوون.

شەنیا: زۆر ئاشکرا دیار بوو.

ڕەوەز: زۆرم پێخۆشە تۆ غەدرو زەلیلیی قبوڵ ناکەی، ئەوەتم زۆر بە دڵە.. بۆ ئەم سەرۆکەش ئامۆژگاریی باشی بکە.. ڕاستە من پیاوی ئەوم، بەڵام غەدر قبوڵ ناکەین.. پێشی بڵێ زۆر لە ڕەمزی ئازیزتر نیت لای هیچ کەسێکمان، لەبەرئەوە سنوری خۆت بزانەو مەیبەزێنە.. شەنیا گیان ئێمە تۆ ئەکەین بە نوێنەری خۆمان لای سەرۆک.

شەنیا: ئێوە ڕوحی منن، دیدەوان کێیە، گوێی ئەویشت بۆ ئەبڕم، هەرچییەکت بەدل نییە بە خۆم بڵێ. هههە

(( هەر یەکەو دەستێک ئەکێشێ بە دەستی ئەویترا، وەک اتفاق))

ڕەوەز: بڵێ لەمەولا ئەوەی بە هۆی پلانی تۆوە پەیای ئەکەین، ئەوە نییە نیوەیت بدرێتێ، ئاخر ئەقڵ نایبڕێ!

شەنیا: واو!! نیوااااا؟

ڕەوەز: بەڵێ ڕەمزی نیوەی لێ ئەسەندین.. بیکا بە ٢٥% هەر زۆر باشە.

شەنیا: ئەوە من کردم بە ٢٠% و یەک قسەشی تیا بکا، هەر ناشهێڵم بزانێ چۆن ئەگاتە لای ڕەمزی.. چیتر؟

ڕەوەز: ئەڵێی ئەمیشت خۆش ناوێ.

شەنیا: بەڵێ ئەمم خۆش ئەوێ، بەڵام جارێ سەرەتایە، خۆی من تاقەتی کەسم نییە ئەمرم بەسەرا بکا، با بزانم تەبیعەتی ئەم چۆنە؟ وا جارێ خەریکی مێبازییە لەگەڵ پیرێژەنەکەی دایکی ئامۆیا هەهە.

ڕەوەز: سەرەی پیرێژنەکەش دێت.

سەنیا: ئەی ئەبێ سەرەی بێت ئەی چۆن؟ خۆی داماوە، بەس لەبەر ئامۆ، هەر ئەبێ بڕوا.

ڕەوەز: منیش ئەمەوێ سوێ بکەم بە دڵی کوڕەکەیتریا.

شەنیا: کەواتە لەبەرخاتری ئەو دوو کوڕەی، هەر ئەیکوژین، بەڵام با کاتی خۆی بێت.

ڕەوەز: ئەی بە خاوەنی ئێرەت وتووە ڕەمزی کوژراوە؟

شەنیا: نا جارێ، با بڵاو بێتەوە، ئەوسا ئەچم پێی ئەڵێم.. ئەی خۆ منیش لەگەڵ خەڵکا ئەیبیسم کە کوژراوە هههە.. بەڵام ئیتر مەیە بۆ ئێرە، کاکە منیش کەپڵێکی خوێڕیم هەیە، ئەڵێم با شوویەکی پێ بکەم، نەک بتبینێ و دڵ پیس بکا.

ڕەوەز: ئەی هاتەوە؟

شەنیا: ئەمڕۆ دێتەوە.. با بەریەک نەکەون باشترە.. نەک زۆر خوێڕیتریش دەرچێ لەوەی من چاوەڕوانی ئەکەم، هەر نەیناسی باشترە.

ڕەوەز: بەخوا تۆ ئەوەندە زۆرزان و جانانەی، من دەرەقەتت نایەم.. تۆ ئەوەمان بۆ بکەو ئیتر من نایەم بۆ ئێرە، لە دەرەوە دائەنیشین.

شەنیا: بەڵام بەپێی دەرفەتی من، نامەوێ ئەم هەتیوە لەدەست بەم.

ڕەوەز: دەی پیرۆزە!

Cut

دیمەنی – ١٣٧٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٦٨ – ڕ/ن - ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن و دیدەوان))

دیدەوان: دەسەڵات نییە، چی بکەین؟ کە کوڕەکان هەڕەشەی سەرهەڵگرتنت لێ بکەن، ناچاریین دەست لە هاوسەرگیرییەکە هەڵگرین.. بەڵام خۆ ئەتوانین وەکو هاوڕێی دڵسۆزی یەکتر بەردەوام بین.

نارەوەن(( کز)): وەڵا نازانم هیچ بڵێم.. دڵنیابە کوڕەکان یان کچەکە بێتەوەو لێرە بتبینن، توشی سەرێشەیەکی گەورە ئەبم.. دەی ئیتر چۆن بتوانین هاوڕێ بین.

دیدەوان: ئەی ئیشەکەت بیرچووەوە؟

نارەوەن: بیرم نەچووە، بەڵام کاک ڕەمزی ڕاسپاردەی زۆر خراپی بۆ ئەناردم بەو شەنیایەی لای خۆیا، ئەگەر ئەو کچە نەبووایە، ڕەنگە بشکوژرامایە.

دیدەوان: چۆن؟ کچەکە چۆن فریاتکەوت؟

نارەوەن: پێی وتم کە دوای فڕاندنی تۆ، ڕەمزی ئەمهێنێتە ئەم ئیشەوەو ئەمکوژێ.

دیدەوان: جا ڕەمزی چۆن شتی وا ئەکا؟ ئەو لەبەر خاتری من تۆی زۆر خۆش ئەوێ.

نارەوەن: بەخوا، ئەیکا.. ناچارم هەر نەیەمەوە بە لایاو کۆمپانیاکەشم داخست و ئەمەش کلیلەکانی.. نە هیچی من و نە هیچی ئێوە کاکە گیان.

دیدەوان: تۆ مەڵێ کاکە پێم ناخۆشە، ئێمە خۆشەویستی یەکین.. دوای ئەوەش ئەو کلیلانە با هەر لای خۆت بێ و لە تۆ زیاتر کەس بۆی نییە پێ بنێتە ئەو کۆمپانیایەوە، بە ڕەمزیش ئەڵێم بە هیچ جۆرێک نەیەت بەلاتا، تۆ خۆشەویستمی و من خۆم ئەزانم چۆن ئەتپارێزم لەم و لەو.

نارەوەن: تکایە دیدەوان خۆ ئێمە گەنج و هەرزەکار نیین، خۆشەویستیی چی؟ وا مەکە هەڵوێستێکیترت لێوەرگرم، ببوورە، تازە من و ئەو کۆمپانیایەیان نەوتووە.. حەمە

خدریش کەمێکیتر دێتەوەو حەق و حسابی خۆتان چۆن ئەکەن بیکەن.. هیچ پەیوەندیی بە منەوە نییە.

دیدەوان: نا نارەوەن گیان، ئەزانم ئێستا کەمێک لەسەر خۆت نیت و دەمارت گرژە (( هەڵئەسێ)) من جێت ئەهێڵم با زیاتر قسەی تیا نەکەین و نەیوروژێنین. کاتێکیتر پەیوەندیت پێوە ئەکەم و لە شوێنێک یەک ئەبینین.. چونکە ئەو ئیشە ئەبێ بکرێ و تۆو حەمە خدریش بەشەشێری قازانجەکەیتان بەرئەکەوێ.

نارەوەن: من نا، حەمەخدریش باوەڕ ناکەم، کەیفی خۆشیەتی.

دیدەوان: نەیشێوێنی باشترە نارەوەن خان.!

نارەوەن: مەبەستت چییە هەڕەشەیە؟ (( زەنگی بۆ دێت، بۆ دیدەوان قسە ئەکا)) بوەستە مەڕۆ.. (( بۆ مۆبایل)) بەڵێ کاکە.......... (( شڵەژان)) چۆۆۆۆۆن!!! ئەوە بەڕاستتە؟ کەی؟ ........... ئای خوایە!!!......... باشە خوات لەگەڵ. (( بۆ دیدەوان)) حەمە خدر بوو.

دیدەوان: چی ڕوویداوە؟ ڕەنگ بە ڕووتەوە نەماوە.

نارەوەن: ئەڵێ ڕەمزی کوژراوە، تۆ بیستووتە؟

دیدەوان(( شڵەژان)): چۆن چۆن؟ ئەوە بە ڕاستتە؟ .. باشە کاتێکیتر یەک ئەبینینەوە.

(( ڕۆشتنی دیدەوان و دڵخۆش بوونی نارەوەن و بزە))

نارەوەن: ئەوە لە یەکێکیان نەجاتم بوو، خوا دەلیلی داماوانە.. لەوەولاترچێ.

Cut

دیمەنی – ١٣٧٣ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( نینا تێل ئەکات و ئاوا دانیشتووە))

نینا(( خەندە)): هەر داخراوە، کورە ڕەنگە هێشتا لە خەو هەڵنەسابێ، لە ناسکەکانە هەهە.

ئاوا(( سوعبەت)): دیارە ئێمە لە زبرەکانین؟!

نینا: خۆت ڕای من باش ئەزانی، کەس نییە لەم دنیایەدا بەقەدەر تۆ ناسک بێ خۆم نەبم هههە. بەڵام ئەو ناخۆشی کردبوو.. ئەو پەڕەو کاغەزانەی ئەمدیوەودیو کرد، چوو یەک سەعات دەست و دەموچاوی شت.. کورە درەنگمە درەنگمە هیچ سوودی نەبوو، هەر ئەیوت وا هاتم.

ئاوا: دەی ئیتر منیش وا ئەکەم، با پێم بوترێ لە ناسکەکانە.

نینا(( سوعبەت و بزە)): دەی غیرە ئەتخوا ئیشەڵڵا، کورە من هەموو دنیا بە نینۆکێکی فرێدراوی تۆ نادەم ئەوە ئەڵێی چی؟ مەبەستم ئەوەیە تۆ پیاوانە هەڵکەوتوویت و پیاوی ئیشی، بەڵام ڕەنگە ئەو نیوەڕۆ خەو بکا، ئەرەوەڵا ئەسڵەن ئەوەندە ناسکانە هەڵس و کەوتی ئەکرد، زەڕڕەیەک چییە؟ ئەها زەڕڕەیەک.. پیاوەتی تیا نەبوو. هەر وامئەزانی منالە.

ئاوا: نیوەڕۆ خەو بکا قەینا، ئەترسم عەسرەخەو بکا.

نینا: دوور نییە، کەمێکیتریش بۆی ئەکەمەوە، بزانم کەی جەنابی لە خەو هەڵئەسێ.

ئاوا: بەڵام بەسەری هەردووکمان نینا، هەڵەیەک لەو بابەتەدا هەیە.. قەت بڕوا ناکەم باوکت ئەو هەمووەی هەبووبێ.. کچێ خۆ من ئەو پارەیەم بۆ تەواو کرد کە لە بابەتەکەی پورە گێلاسا هاتەوە سەری.. پیاو ئەوەندەی هەبێ، چۆن بۆ پارەیەکی کەم دائەمێنێ؟

نینا: نازانم.. ئەوەش ڕاستە، تۆ بڵێی باوکم نەیویستبێ لە پڕێکا ئاشکرایکا.. ڕاست ئەکەی قەت خۆی وا دەرنەخست کە پارەی وای هەبێ.. وایە.. ئەمە زۆر زۆرە.

ئاوا: ئەگەر وەرتگرت، هەوڵبە من قسەی لەگەڵ بکەم و ئێوارە لە شوێنێک بیبینین.

نینا (( قلق )): ئەی چۆن؟ هەر ئەبێ بیدەمە دەست خۆتەوە.

ئاوا: شتەکەش لە ڕاست ئەچێ، هەمووی خانوو و بەرەیە.

نینا: خوایە خێر بێ و لەم دڵەڕاوکێیە ڕزگارمکەی.. بەخوا بە ڕووکەش کەسێکی زۆر باش بوو، هەر بە خوشکەکەم بانگی ئەکردم و خوانەخواست یەک تیلە چاوی خراپیشیم هەست پێنەکرد.. هەرچییەکیشی ئەوت وا دەرئەچوو.. زۆر بەڕێز بوو.

ئاوا: خۆ ئێستا هیچ نەبووە بەرخەکەم، خۆت بۆ ئەترسێنی؟ دڵنیام لەوەی پیاوێکی باش بووە، ئەتناسم چەند هەستیاری بۆ پیاو.. بەڵام تەنها گومانێکەو هیچیتر.. ئەویش ڕەنگە تۆ باشت جیانەکردبێتەوە.. مەبەستم تەنها زۆریی پارەکەیە.

نینا: نەوەڵا سێ جاریش بەسەریا هاتمەوە، حسابەکەی من تەواوە، هەر وا دەرئەچێ.. سەیری هەموو گرێبەستەکانم کردووە، لە نێوانی هەردووکیانە، ئەوە نییە یەکێکیان ناوی باوکمی تیا نەبێ.. ڕاستیش ئەکەی پارەکە خەیاڵییە.

ئاوا: دەی کەواتە خوا نەیبڕێ، ئەمە خوا بۆی ناردووی، قەرەبووی ڕۆژانی سەغڵەتیی و نەهامەتیتە کە تێت پەڕاندووە.

نینا: هانام بەدەمت، جا کوا؟

(( نینا تێل ئەکاتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٣٧٤ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( نیگارو دەوران شەنیا ئەگرین))

نیگار: ئەی خوایە بۆ وامان بەسەر بێ ئاخر؟! ڕەمزی داماو چی کردبوو؟ ئەوەی ئەو کوڕە ئەیزانی تەنها دڵسۆزیی دەربڕین بوو بۆ من و ئیش کردن.. ئەی هاوار چۆن پشت و پەنام نەما بەم حاڵەوە.

شەنیا: بەخوا پیاوێکی دەگمەن بوو، هەموومانی بە خوشک و دایکی خۆی ئەزانی.. ئای چەند باش بوو خوایە گیان لەگەڵ منیش.

دەوران: خوا عافوویکا، بەڕاستی باوکم هەبووایەو بمردایە هەر ئەوەندە کاری تێ ئەکردم، هەستم بە بێ باوکی نەئەکرد.. ئەو قەڵای پشتی من و دایکم بوو.

نیگار(( خۆی هێمن ئەکاتەوە)): خوایە گیان ساردی ساردتر نەدەی.. ئەمە دوو.. خوایە سێیەمم نەهێنیتە ڕێ. حەز بێ و بەس بێ خوای گەورە!

شەنیا: ئیشەڵا ئەخیری بەڵاو موسیبەت ئەبێ.

نیگار: دەوران گیان بەساقەوبم چاوێکیشت لە زوبێر بێ، نەک خوا سێیەم بەڵا لەو گیرکا.. خوایە لە عومری منی هەڵگری بیخەیتە سەر عومری دەوران و زوبێر.

شەنیا: ئیشەڵڵا هیچیتر نابێ نیگار خان توخوا خۆت سەغڵەت مەکە هەر تۆمان هەیت بەم هەمووە.

نیگار: نا شەنیا گیان خەمت نەبێ من هیچم لێ نایەت.. ئەی کێ بمێنێتەوە بۆ مەینەتیی و قوڕبەسەریی؟

شەنیا: نا ئیشەڵڵا نەگبەت نابی، ئەمە دوا خەم ئەبێ.. ئەی کارگەکە نیگار خان؟

نیگار: چاوی کارگە دەرئەهات دوور لە قسەکەت، خۆت چی لێ ئەکەی لێیکە کچم.

شەنیا: ڕەحمەتی باشی فێرکردم، وا جارێ ئەیبەم بەڕێوە تا ئیشەڵڵا خۆت هەڵئەسیتەوە سەرپێ. ———— Cut ————

دیمەنی – ١٣٧٥ – ڕ / ن – ژووری ئەو خانوەی دیدەوانی تیا سجن بوو:

(( دیدەوان و زاهیدو ڕێبوار))

ڕێبوار: بەڵێ متمانەی ١٠٠% ە، زۆر بێخەمبە لێی، هەموو ئیشێکمان بۆ ئەکا.

دیدەوان: کەواتە سبەی بیهێنە بۆ کۆمپانیاکەی نارەوەنی لێبوو، با بیبینم تێستێکی بکەم.

ڕێبوار: زۆر سوپاس گەورەم، بەخوا لەو ڕۆژەوەی خدر بینیویەتی هات بۆ لای من، زۆر تێکشکاوە، خۆزگە شتێکت بۆ ئەکرد، زۆر گوناحە.

دیدەوان: ئا زاهید باش بوو بیری خستینەوە، چیت کرد بۆ ئەوەی خدر؟

زاهید: گەورەم هەموو شتێک تەواو بە دڵی خۆتە.. سەعاتێکیتر لەم وڵاتەیا نامێنێ.

دیدەوان: دەی ئێوەش سەعاتێکیتر خدر تەواوکەن.

# (( ئەڵقەی شەست و شەش))

زاهید: قوربان ئەیهێنم پێڵاوی تۆش و ئەو ژنەشی پێ ماچ ئەکەم، زۆر بێخەمبە.

ڕێبوار: ئەتوانم بزانم چی کراوە؟

زاهید: دوای یەک سەعات و نیویتر، بەڵێ هەموو شتێک ئەزانی.

دیدەوان: دەبڕۆ دەرەوەو بەو ژنە ڕابگەیەنە سەرفرازمان کرد.

ڕێبوار: ئەک خوا پایەدارترتکا گەورەم، زۆر مەمنونم.. سوپاس بۆ ئەوەی ڕەزامەندیت بەوەی بچووکیتان ئەکەم.

(( ڕێبوار ئەچێتە دەرەوەو هەر لە ژوورەوە مۆبایل دەرئەهێنێ))

Cut

دیمەنی – ١٣٧٦ – ڕ / ن – چێشتخانەیەک:

(( تریفەو خدر نان ئەخۆن ))

تریفە: یەعنی لە ئێستاوە بە ئامۆو ئاواش بڵێین؟

خدر: بەڕای من ئا، هەر ئەم دە پانزە ڕۆژە تێپەڕی، ناهێڵین یەک سەعاتیتر بخایەنێ.. هەموو شتێک کۆتایی پێ ئەهێنین و ئەچینە ماڵی خۆمانەوە.

تریفە(( بزە )): ئێ خۆ جارێ هیچ پوشت نەخستووە؟ هههە.

خدر: لە بەیانییەوە دەست پێ ئەکەم، خانوویەک جۆر ئەکەم و بە ماوەیەکی کەمیش هەموو شتەکان پێکەوە ئەکڕین.. بۆیە باشترە ئەوانیش بزانن.

تریفە: خانووی چی جۆر ئەکەی؟ ئەی خانووەکەی من چییەتی؟ خۆ خۆی پیس نەکردووە؟

خدر(( پێکەنین )): نا بەساقەوبم، ئەوەیان هی خۆتە، بڕیارمان وابوو بیفرۆشیت و بەو پارەیەوە کە وەرتگرتەوە، ئیشێکی باشی پێوە بکەی.

تریفە: ئەو بڕیارە پێش ئەوە بوو پەیوەندیمان دروست بێ.. لەوکاتەوەی بڕیاری هاوسەرگیریمان دا، دامناوە ببێتە ماڵی خۆمان، ئەچینە ئەوێوەو یەک قسەش ناکەی.

خدر: بەڵێ بەسەرچاو، ئەوە بە قسەم کردی.. بەڵام مەرجێکم هەیە.

تریفە: مەرجت سەرچاوم.

خدر: مناڵی زۆرم ئەوێ، زۆر زۆر! توخوا با وەک خۆم تاقانە نەبن.

تریفە: هەرچەندێ خوا بیدا، تۆ پێم بڵێ دایکم زەنگی نەما هههە، چیت پێوت؟

خدر: ئەوە باسێکە لەوانەی کە بۆی بچیتە لای هەندرێن.. هەر کە چووینەوە، بڵێ من ئەچم بۆ حساباتی ئەمرۆ.. هەستە با بڕۆین، باش بوو بیرت خستمەوە. (( هەڵئەسن ))

Cut

دیمەنی – ١٣٧٧ – ڕ / د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( دڵنیاو سەرچڵ ))

سەرچڵ: نا گیانی گیان ئیشی چی؟ خۆ پێموتی، لە مانگێکا کچێ تۆ بڵێ لە ساڵێکا یەکجار ئەو ئیشە بکەی، پەکمان ناکەوێ.. ئیتر بۆ خۆمان بڕەنجێنین و بە ئیشەوەو ماندووش بین.. هەر خەریکی گەشتوگوزار ئەبین و وڵاتانی دنیا ئەگەڕێین.

دڵنیا: باشە، کەواتە دوای ئەم ئیشە ئەچینە ماڵی خۆمانەوە، وایە؟

سەرچڵ: دووبەیانی تۆ دەرئەچی بۆ گەشتەکەت.. کە هاتیەوە، من ئێوارەکەی ژنان ئەنێرم.

دڵنیا: نا ئێواران نابێ شێتە، بە عەسران بیاننێرە.

سەرچڵ: وەی سەرچاو، بۆ سبەی عەسرەکەی خۆتان ئامادەکەن.. بەڵام کەمێک دەسکاریی بەرنامەی گەشتەکەیان کردووە.

دڵنیا: بە خراپ یان بە باش؟

سەرچڵ: تا ئەچن و ئەشگەڕێنەوە هەر بەخاتری پاراستنی ئێوە بە باش دەسکاری ئەکرێ، خراپ چییە؟

دڵنیا: چۆن؟

سەرچڵ: هەندێ لاڕێی تێ ئەکەوێ، بۆ خۆدزینەوە لە ئاسایش، ئەڵێن پشکنینی ئێستایان زۆر وردە.. لەبەرئەوە بە لاڕێشدا ئەڕۆن.. هەر کاتێکیش لێتان پەیا بوون، ئەوە خواردنی ئامادەتان هەیەو ئێوە بۆ سەفرە چوون.. پیاوێکیشیان بۆ داناون لەگەڵتانا بێ، زۆر شارەزایە.

دڵنیا: تۆ لە هەموو شتێک دڵنیای؟

سەرچڵ: هەر زۆریش.

Cut

دیمەنی – ١٣٧٨ – ڕ/ د – بەردەمی ئۆفیسی وەكالەت:

(( هاورِێ پیاڵە ئەشوات.. مناڵێک دێت بۆلای))

مناڵ(( زەرفێكی بە دەستەوەیە)): خاڵە كاک خدر كێیە؟

هاوڕێ: كاک حەمە خدرت بۆ چییە باوانەكەم؟

مناڵ(( ئاماژەی سەر جادەكە ئەكا)): وەڵا ئەو پیاوە .. ئەوە لەوێ نەماوە، ڕۆیشتووە..

هاوڕێ: ئێ، ئەو پیاوە چی؟

مناڵ: وتی ئەو زەرفە بەرە بۆ كاک خدر.

هاوڕێ: باشە بمدەرێ بۆی ئەبەم.

مناڵ: نا با خۆم بیدەمێ.

هاوڕێ(( بەرەو دەرگای ئۆفیس ئەچێ)): باشە بوەستە.(( لە دەرگاوە خدر بانگ ئەكات و خدر دێتە دەرەوە)) ئەو مناڵە شتی پێیە بۆ تۆ.

مناڵ: وەڵا پیاوێک ئەم زەرفەی دامێ و ئەو پارەیەشی دا بەخۆم، ئەو زەرفەت بدەمێ.

خدر: باشە دەستخۆش باوكە گیان.. تۆ بڕۆ.. (( خدر زەرفەكە ئەكاتەوە كۆمەڵێک وێنەیە، یەكەم دانە ئەبینێت و توشی شۆک ئەبێ، وێنەی نیناو شەپۆل كە دەستی بە پشتیەوەیە، زۆر بە پەلە ئەوانیتریش هەڵئەداتەوەو ئەیخاتەوە زەرفەكەو نامەیەكی تیایە ئەیخوێنێتەوە.. زۆر ئەشڵەژێ.. نامەكە هەڵئەگرێت)) نینا؟؟؟؟؟؟؟ ناچێتە ئەقڵەوە! چۆن شتی وا ئەكا؟

خدر: سەیرە.

هاوڕێ: ئەوە خێر وا تێكچووی كاک حەمە خدر؟

خدر: نا هاوڕێ گیان هیچ نییە.

(( خدر زەرفەكە ئەخاتە ژێر چاكەتەكەیەوەو ئەچێتەوە بۆ ئۆفیسەكە))ـ **تابع** ـ Cut ـ

دیمەنی – ١٣٧٩ – متبوع – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن، نارەوەن هەر لە دوورەوە سەرنجی خدر ئەداو پێی سەیر ئەبێ تێکچووە ))

نارەوەن: ئەوە چیتە حەمەخدر؟ وا نەبووی؟

خدر: هیچ نییە نارە گیان، هیچ نییە.

نارەوەن: تۆ ئەزانی چیت لێهاتووە؟ چۆن هیچ نییە؟

خدر(( ئاهـ هەڵکێشان و خەفەت و وردبوونەوە بۆ قسە کردن)): نارە گیان، ئێمە کە ئەم ئیشەمان هەڵبژاردووە، هەڵبەت ئەبێ چاوەڕوانی باش و خراپ بکەین.

نارەوەن: کورە تۆ پێم بڵێ چی ڕوویداوە، ئەوانە ئەزانم.

خدر: پێت ئەڵێم، بەڵام ئەمە نابێ هیچ کەسێکیتر بیزانێ، تۆش بەهۆی ئیشەکەوە پێت ئەڵێم و ئەزانم نایدرکێنی.

نارەوەن: من کەی شتم درکاندووە؟

خدر: مەبەستم ئەوە نییە درکاندبێتت، بەڵام ئەمەیان تایبەتە بە خێزانەکەوە، تازە منیش یەکێکم لە ئێوە، نابێ تریفەش ئەمە بزانێ.. هەر من و تۆ، تا چارەسەرێکی بۆ ئەدۆزینەوە.

نارەوەن: باشە وا ئەکەین بەقوربان، پێم بڵێ چی بووە.

خدر(( نامەکە لە گیرفانی دەرئەهێنێت و ئەیخوێنێتەوە)): سڵاوێکی گەرم خدر گیان.. دڵنیام کە وێنەکانت بینی توشی شۆک ئەبی، چونکە تۆو هەموو خێزانی دارەوانیش وا ئەزانن نینا گەوهەرێکی پاکی ناو ئێوەیە.. ببینە چۆن لەگەڵما دێتە خانووی چۆڵەوە کە خۆم دەرگای ئەکەمەوە.. من سەرەتا لە بەردەرگاوە چاوچاوێنم لەگەڵ کردو ڕازیم کرد، دواتریش چووینە قاوەخانەیەک و ژوانمان ڕێکخست و دواتریش بردمەوە بۆ ماڵی خۆمان، وێنەکان شایەتن.. (( نارەوەن ئەکێشێ بە خۆیا )) بەڵێنی هیچیشم پێ نەدا بۆ

زانیاریت، ئەو بەڵێنی پارەیەکی پێدام کە بۆم بدزێ لە ئاوای مێردی.. بەڵام ئەو پارەیەم بە دڵ نەبوو.. بڕیارمدا وێنەکان سەرەتا بۆ تۆ بنێرم و ئەگەر هەر هەڵەیەکی بچووک بکەی لە چرکەیەکدا هەموو دنیا وێنەکان ئەبینن.. واتە بڵاوی ئەکەمەوە.. بەرامبەر بە بڵاو نەکردنەوەی وێنەکانیشت، مەرجم هەیەو دواتر لە مەرجەکان ئاگادار ئەکەمەوە.. وەک وتم بە هەڵەیەکی تۆ، من دەسکراوە ئەبم.

خدر: ئەوەش وێنەکان (( وێنەکان ئەدا بە نارەوەن))

نارەوەن(( تەماشایان ئەکات و زۆر ئەشڵەژێ)): نینا؟ ئاخر ئاخر ئەی هاوار خۆ وەک پەپولە خۆی نیشان ئەدا.. ئەی هاوار بەماڵم، حەیاچوو خۆمان! (( ئەگری))

خدر: وەختی گریان نییە ئێستا تریفە دێتەوە.. من خۆم بۆ ناگیرێ، ئەبێ بزانم ئەمە چییە؟ ئەزانی چیم بۆ بکە؟ (( نارەوەن ئەگری و وەڵام ناداتەوە)) کچێ لەگەڵ تۆمە، وتم وەک ئیش سەیری ئەم مەسەلەیەش بکە.

نارەوەن: ئیشی چی؟ ئەوە دڵنیابە بڵاویشی ئەکاتەوە.

خدر: تۆ ئاوام بۆ بانگکە بۆ ئەمبەرو لێگەڕێ من بچم نینا ببینم و بزانم ئەسڵی ئەمە وایە؟.. ئەوە بکە خێرا.

نارەوەن: جا بڵێم چی؟

خدر: بڵێ زۆر بێتاقەتم بمبە بۆ شوێنێک.. چوزانم هەر شوێنێک بێ.

نارەوەن: ئاخر قەت شتی وام بە ئاوا نەوتووە، تا ئاسایی وەریگرێ، خۆشم بۆ ناگیرێ، بەخوا هەست بە شتیک ئەکا.

خدر: کەللەم ئاوساوە نارە گیان، وەختی ئەو قسانە نییە، شتێک بدۆزەرەوەو تەواو.

نارەوەن(( فرمێکسکی ئەسڕێ)): باشە، یەک دەقە بوەستە.. ئا.. ئەڵێم زەختم بەرز بۆتەوە بمبە بۆ نەخۆشخانە.

خدر: هەر زۆر باشە(( هەڵئەسێ و وێنەکان ئەخاتەوە زەرفەکەو لە ژێر چاکەت دایئەنێتەوە)) من ئەچم تریفەت بۆ ئەنێرمەوەو کە ئاوا دەرکەوت بێت بەرەو لای تۆ، من ئەچمە ئەوێ.

(( ڕۆشتنی خدر بە تووڕەیی و بێ میزاج))

Cut

دیمەنی – ١٣٨٠ – ڕ / ن – قاوەخانە:

(( ساماڵ و شەنیا ))

ساماڵ: باشە کە ئەوەندە دڕندە بوو، چۆن کوژرا؟ کێ کوشتی؟ چۆن کەوتە تەڵەوە؟

شەنیا: وردەکارییەکەی نازانم، ئەوەندەی هەیە، پۆلیس تەرمەکەی بە لنگەوقووچیی لە چاڵێکدا دۆزیوەتەوە.. گرنگ ئەوەیە بەلایەکمان لە کۆڵ بووەوە، کە نەمانئەزانی بەرەو کوێمان ئەبا.

ساماڵ: کەواتە ئەوە جێی خۆشحاڵییە زیاتر، وەک لەوەی دڵتەنگ بین؟

شەنیا: بۆ کێ دڵتەنگ ئەبی بە قوربان؟ ڕەمزی؟ حاح!!! بەڵام باشتر وایە من تۆ بێنمە کارگەکەوە.. ئەو کارگەیە شتێکی تیایە، تا ئێستا نەمتوانیوە بە هیچ کەسێکی بڵێم و بشموتایە، کوژرابووم.. بەڵام بە ملشکاندنی ڕەمزی، ئێستا تەنها من ئەیزانم.

ساماڵ: ئەو شتە ئەبێ چی بێ کە ئەوەندە نهێنییە؟

شەنیا: بە هاوسەرگیرییەکەمان ئەتوانم پێت بڵێم، شتی درکاندن نییە، ژیانی خۆم بارمتەکەیەتی.

ساماڵ: کەواتە ئەوەندە متمانەت پێم نییە باسێکی وام لا بکەیتەوە.. ناهەقت ناگرم، هەڵبەت بە ئەزمونی دژوارو ناخۆشا تێپەڕیویت.

شەنیا(( پێکەنین)): نا بەساقەوبم ئەوە شتێک نییە لە لق و پۆپی متمانە.. ئەوە تەنها پەیوەندیی بەو کەسەوە هەیە کە ئەبێتە هاوسەرم، چونکە من دەرەقەتی ئەوە نایەم بە تەنهاو هەرگیز لە مێرد ناشارڕێتەوە.. تۆش جارێ هیچت دیار نییەو ڕاست ئەکەی ئەو ئەزموونانەم تێپەڕاندووە.

ساماڵ: زۆر سوپاس بۆ ڕاشکاویی بەرەوڕوو قسە کردنت، کەسی وا دەگمەنە لەم ڕۆژگارەدا.. من هەموو داهاتووی خۆم لەسەر تۆ هەڵچنیوە، ئەگەر تۆ نەبی، مەحاڵە من بگەمە کەسێکیتر لەو ئاستەی تۆدا........

شەنیا: هههەه باوەڕ ئەکەی چەند جارێکیتر ئەو قسانەم لە خەڵکیتر بیستووە، دواییش دەرئەکەوێ یا هەڵچوونێکی کاتیی بووە، یان گاڵتەی لەگەڵ کردووم بۆ ئەوەی دڵم خۆش بێ، یان ئەسڵەن نییەتێکی وای هەر نەبووەو تەفرەی داوم.

ساماڵ: ئۆو کەواتە پەیوەندیشت زۆر بووە، بەڵام من کارم پێیان نییە، ئێستای تۆم مەبەستە، نەک ڕابردووت.

شەنیا: مەرج نییە هەموو ئەوەی وای پێوتووم، ڕازی بووبم بە داوای پەیوەندییەکەی، بەڵام ئیتر ڕاست، درۆ، ئەیانوت.. ئەو کەسەی باوەڕم پێی کرد، تەنها ئامۆ بوو، بۆم باسکردوویت.. ئەویش باوەڕ مەکە سزای نەدەم لەسەر فەرامۆش کردنەکەی.

ساماڵ: ئەی من؟

شەنیا: ڕاستت بوێ نازانم! تۆ لە دڵما زۆر شیرینیی و بە حەق خۆشم ئەوێی لێم نەشاردوویتەوە.. بەڵام نازانم چۆن دێیتە پێشەوەو ئەگەینە کوێ؟.. من ئامادەم بە تەواویی، ئەویتریش لای تۆیە.

ساماڵ: با کەمێک پرسەی ڕەحمەتیی کۆن ببێ، ئەوسا ئامادەیی من ئەبینی چەند لەوی تۆ گەرموگوڕترە.

شەنیا: یاخوا وابێ. هەهە

Cut

دیمەنی – ١٣٨١ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و کارە ))

کارە: ئەوە هیچ ڕوویداوە کاک هاوڕێ؟ مامە خدر زۆر شڵەژاوە.

هاوڕێ: تۆ هەقت نەبێ، ئەگەر شتەکە پەیوەندیی بە ئێمەوە هەبووایە، هەڵبەت پێی ئەوتین.

کارە: وەڵا ڕاستە.

Cut

دیمەنی – ١٣٨٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا – ژووری ئاوا:

(( خدر گرژ دێتە ژوورەوەو نینا لەبەری هەڵئەسێ و بەخێرهاتنی گەرمی ئەکاو ئەویش سارد وەڵام ئەداتەوەو دائەنیشێ ))

نینا: چییە کاک حەمەخدر، کەمێک بێتاقەت دیاری و وەک ئەوەی ئیشێکیشت بە من بێ وا دەرئەکەوی.

خدر: هاتووم ڕوونکردنەوەیەکت لێوەرگرم نینا گیان.. سوێند بخۆ ڕاستگۆ بیت و بە ڕاشکاویی هەموو شتێکم بۆ باسکەی، چونکە دڵنیابە، خۆم هەموو شتێک ئەزانم.

نینا(( بەلایەوە سەیر ئەبێ)): ئەبێ چ شتێک هەبێ ئەوەندە تایبەت بێ، شایانی شاردنەوە بێ لە جەنابت، من ڕاستگۆ ئەبم پێویست بە سوێند ناکا، بەڵام لەبەر دڵی تۆ، بە گۆڕی باوکم و بە گۆڕی ڕۆڤان درۆت لەگەڵ ناکەم و ڕاشکاویش ئەبم لەگەڵتا.. ڕاستییەکەی من هیچ شک نابەم.

خدر: نینا هیچ ژنێکی هاوڕێت هەیە، ئەوەندەی تۆ، مێردەکەی باش و جوان و کەشخە بێ؟

نینا: بە دڵنیایی نا؟ هەموو هاوڕێکانیشم لێم تەوەلا بوون بەو هۆیەوە، باوەڕ ئەکەی زۆرێکیان پێیان ناخۆشە؟ هههە ئیتر خەڵک وایە.. بەڵام ئەم پرسیارە بۆ؟

خدر: کەس هەیە لە مێردی تۆ بەدەسودڵ و دەوڵەمەندتر؟

نینا: من هیچ تێناگەم کاک حەمە خدر، تکایە ئەم پرسیارانە چییە؟

خدر: تۆ جارێ وەڵامم بدەرەوە.

نینا: نەخێر، هەرچیم ویستبێ ئاوا درێغیی لەگەڵ نەکردووم.

خدر: دوا پرسیارم، لە هیچت کەمە نینا؟ داوا لە هەر کەسێکمان بکەی بۆ هەر شتێک، کەس دەست ئەنێ بە ڕووتەوە؟

نینا: زۆر دڵنیام نەخێر، خەریکە تێک ئەچم کاک حەمەخدر، تکایە مەبەستی پرسیارەکانتم پێ بڵێ.

خدر: ئەی چۆن پێت ناڵێم (( دەست ئەبا بۆ ژێر چاکەتەکەی وێنەکان دەرئەهێنێ)) ئەی ئەمەت لە چی دادە گیان؟

نینا(( تەماشای یەکەم وێنە ئەکات)): وای ی ی ی ی .. ئەوە چییە کاک حەمەخدر؟ تۆ ئەو وێنانەت گرتووە؟ (( بەردەوام ئەبێ لە سەیرکردنی وێنەکان))

خدر: نەخێر هەر هەموو ئەوەندە لە تۆ دڵنیا بووین، هەرگیز کەسێک چاودێریی ڕەوشتی تۆی نەکردووە، تا بەدواتەوە بێ.. فەرموو ئەم نامەیەش بخوێنەرەوە، بزانە کێ ئەو وێنانەی بۆ ناردووم. (( نامەکەی ئەداتێ))

نینا(( وێنەکان لەسەر مێزەکە فڕێ ئەدات و نامەکە ئەخوێنێتەوە)): وای چ بێ ڕەوشتێک بوو!!!!! ئەمەیان بۆ دروست کردووم؟

خدر: دروستکردنی چی دایکەکەم؟ ئەوە هەموو بەڵگەن، کابرا هەموو قسەکانی بە بەبەڵگە سەلماندووە.

نینا: کاک حەمەخدر فیشەک بە تاریکییەوە مەنێ.. تکایە گوێ بگرە، ئەم بابەتە ئاواش ئاگاداریەتی، بە هیچ جۆرێک ئەوەی ئەم کابرایە بۆی ناردووی بەو جۆرە نییە کە هەڵیبەستووە، ئەمە پیلانێکەو من و تۆشی پێ خراوینەتە چاڵەوە (( ئەگری)) بە زاتی خوا وا نییە با بۆت باسکەم چۆن هاتۆتە پێشەوە.

خدر: هەرچییەک بێ ئەو وێنانە بڵاوبێتەوە، خەڵک ئەڵێن چی؟ ئەی ئاوای مێردت؟

نینا: توخوا فریامکەوە کاک حەمە خدر دەستم دامێنت، شتێکم بۆ بکە بەقوربانت بم نیشانی ئاوای نەدەی، بیللاهی ڕێک تەڵاقم ئەدا ئەمانە ببینێ (( گریان)) باوەڕکە ئەوەی بۆت باس ئەکەم لەوە زیاتر هیچیتر نەبووە، ڕاستە ئاوا ئەزانێ، بەڵام ئەو هیچ و پووچانە بە جۆرێک وێنەیان گرتووم، باسەکەیان گۆڕیوە.

Cut

دیمەنی ١٣٨٣ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ڕێبوار:

(( ڕێبوارو تافان))

ڕێبوار: ئەوە کێشەکەش چارەسەر بوو تەواو، سبەی کە سەرۆکت بینی وا بکە ئەوەندە بچیتە دڵیەوە لای خۆی داتبمەزرێنێ.. ئەبێ کەسانی گروپەکە لە چواردەوری بن.

تافان: خەمت نەبێ خۆم زۆر شیک ئەکەم.

ڕێبوار: مەبەستم جوانیی نییە تافە گیان.. ئەبێ بە زمان خۆت شیرینکەی.. ئەگەر جلوبەرگیشت باش بێ خراپ نییە.. بەڵام گرنگ شێوازی قسە کردن و نەرمیی و داناییە، ئەو پیرە زۆرگوێی بە جوانیت نییە.

تافان: باشە، تێگەیشتم، وا ئەکەم زۆر سوپاسیشت بکا کە منی پێ ئەناسێنی.

ڕێبوار: ئافەرین.. دەی ئینجا چ ئەمرێکت هەیە لە خزمەتتا بم؟

تافان: کورە بەساقەی تۆ بم زاڵم ئەمر نەکا، تۆ ئەوەی خدرت لە کۆڵ کردمەوە، ئیتر من چیم بوێ لەتۆ؟ ئاییی ئەبێ ئێستا لە چ کێشەو هەرایەکابن. تۆ بڵێی تەلاقی نەدا؟

ڕێبوار: نا یاخوا تەلاقی نەدا، ڕێسەکەمان ئەکاتەوە بە خوری.. ئەگەر بزانی تا ئێستا مەرجەکانیان پێ نەوتووە، کە یەکێکیان دەم داخستنیەتی لەوەی تۆی لەوێدا بینی و پێموتی ئەگەر یەخەی گرتی ئەو کەسە کێ بوو چووی بۆ لای و ئەوانە کێن لەسەرت هەڵئەدەنێ، چی وەڵام ئەدەیتەوە؟

تافان: بەڵێ، من ئاگاداری هیچ نیم و ئەو ماڵەش ماڵی جوانەی پورم بوو، عیمارەکەم لێ تێکچوو بوو.. جوانەش هەرچییەکی پێ بڵێم بە قسەم ئەکا.. ئەی کەی بۆ من پێی ئەڵێن؟

ڕێبوار: دوای ئەوەی هەفتەیەک ئەوەستن بزانن ئاوا ژنەکەی تەلاق ئەدا یان نا؟ ئەگەر تەلاقی بدا هیچ مەرجێکی پێ ناوترێ، بەوەی تۆشەوە.

تافان: یەعنی من هەروا لە دڵەڕاوکێدا بم تا هەفتەیەکیتریش؟

ڕێبوار: ئەی وایە تافە گیان، ئەو شتانە چنینی وردی ئەوێ.. چییە با ئەم هەفتەیەشی لەسەربێ؟

تافان: کەواتە دوعای بۆ بکەین تەڵاقی نەدا (( تریقەی پێکەنین ))

Cut

دیمەنی – ١٣٨٤ – ڕ / د – بەردەمی چایخانەکە:

(( خدر بە پەلە جادە ئەبڕێ و دێتەوە بەری ئۆفیسی وەکالەتەکەو کارە بانگ ئەکا ))

خدر: کارە گیان گوێ بگرە بزانە چیت پێ ئەڵێم.

کارە: بەسەرچاو کاک حەمەخدر گیان، ئەمرکە.

خدر:: لەگەڵ ئەوەشدا کە چاودێریی ئۆفیسەکە ئەکەی، هەر چاوێکت ئەکەی بە هەزار چاو.. هەر سەیارەیەکت بینی ئەوەستێ و شتێک ئەداتە دەست کەسێکەوە، یەکسەر بانگم ئەکەیت و ئەچی ڕایئەگری.. ئەگەر نەشوەستا تەقە لە تایەکانی بکەو پەکی بخە، خۆم ئەتگەمێ.

کارە: تەقەشی لێ بکەم؟

خدر: ئەوەی پێموتی، لە تایەکانی.

کارە: ئەی ئەگەر هەر نەوەستا؟

خدر: ئێستا سویچێکی سەیارەکەت بۆ ئەهێنم، بە سەیارەکەی من دوای کەوە، نەک تا من فریا ئەکەوم دەربچن.

کارە: ئەی ئەگەر دابەزی و ڕایکرد؟

خدر: تەقە لە قاچی بکە، گرنگ ئەوەیە نەهێڵی دەربچێ کارە. باشە باوە گیان؟

کارە: فەرمانتە لە خزمەتتام، بە ئاسمانیشەوە بێ ئەیهێنمە خوارەوە.

خدر: دەی وریا بە بەساقە. (( خدر ئەچێتەوە بەرەو ئۆفیس ))

کارە: هیچ خەمت نەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٣٨٥ – ڕ – ئێوارە/ن – ژووری پاڵ سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و گوڵزارو شەنیا سەراپا ڕەشی پۆشیوە بۆ ڕەمزی و بێ مکیاژ، و سەرچڵ))

شەنیا: بەرنامەکەم وابوو، پێش هەر شتێک ڕەوەز ئاگاداری ئەمە نەبێت.

دیدەوان: ڕەوەز بۆ؟

شەنیا: ئەو زۆر ڕقی لە ئاوایە، هەر وێنەکانی بەردەستکەوتایە بڵاوی ئەکردنەوە.

سەرچڵ: ئافەرین، دوو سێ جاریش بە منی وتووە پیلانێکم بۆ ئاوا بۆ دابنێ.. من ئەمزانی ڕقە، زۆر گوێم نەدایە.

دیدەوان: تۆزێ ئاقڵ بووایە بە شەنیای ئەوت هههە، من هەر ئەوەندەم پێوت خدرم بۆ بخەرە داوێکەوە، بە ڕۆژێک بەرنامەکەی دامێ و بە هاوڕێکەی خۆی جێبەجێی کرد.. وا بزانم هەر دوو ڕۆژی پێچوو.

شەنیا: ئەو هاوڕێیەم ئەگەڕایەوە بۆ دەرەوە، ئەبووایە ئیشێکی باشی پێ بکەم.. کە پێموت ئەوەندەت ئەدەمێ ، ئیتر وتی هەر ئیشێک بێ بەسەرچاو.

گوڵزار: بەخوا هاوڕیی باشیش نیعمەتە.

شەنیا: ڕاستییەکەی دوو ڕۆژی تریشی پێچوو، تا سۆراخی شۆڕشم کردو کێ زۆر تێکەڵی بووە و ئیشیان پێکەوە بووە، ئەو ڕزگار ناوەم دۆزییەوەو زانیم کوڕو ژن و کچی ناویان چییە.. هاوڕێکەشم کوڕێکی زۆر ناسک بوو، بۆ ئەو ئیشەی پێت ڕاسپاردم زۆر گونجاو بوو.

دیدەوان: ئێ خۆ من پێموتی خدر بخەرە چاڵەوە، تۆ چۆن بیرت بۆ ئەوە چوو لەوێوە دەست پێ بکەی زاڵم؟

شەنیا: ئاسان بوو.. کە لەگەڵ تریفە تێکەڵ بووم، هەستم ئەکرد دڵی بۆ خدر لێ ئەدا، هەڵبەت خدریش وابووە.. دەی کە بە نیازی هێنانی تریفە بێ، ئەبێ سڕوتڕی ئەو ماڵە بپارێزێ و بە پەرۆشەوە بێ بۆیان.. ئیتر خۆی ئەوە دروست بوو.. وابزنم خراپ نییە.

دیدەوان: کچێ خراپی چی؟ وەک بینیویانە هەر زۆررررر شڵەژاوە.

گوڵزار: بەخوا مەگەر لای تۆ وانە وەرگرم، ئەقڵم بەو شتانە ناشکێ.

دیدەوان: هەرکەسەو ئیشی خۆی.. ڤیدیۆکەتمان بینی قوربان گیان، تۆش باشترین نیشانە پێکەرو بکوژی.. با شەنیا پیلان دابنێ و ئێوەش بەرێیکەن.. دەستی هەموو لایەکتان خۆش.. دوو بەیانی سەردەمێکی تازەی ئێمە دەست پێ ئەکاتەوەو گوڵزار تۆ سەردەقەکەی بە هێنانی ١٢ کیلۆ ئەشکێنی.. ئیتر بتبینم.

گوڵزار: ئەمەش هەر شەنیا گیان پیلانی تازەی بۆ دانا، خۆ ئەگەر بە جادەی سەرەکییا بهاتینایەتەوە، هەر هەموومان بە کڵاو ئەگیراین.

دیدەوان: قوربانی شەنیا.

سەرچڵ: منیش ئیشێکم پێتە شەنیا گیان، شتێکم بۆ بکە.

Cut

دیمەنی – ١٣٨٦ – ڕ – ئێوارە / د – ناو سەیارەی خدر – بەر دەرگای ماڵی نارەوەن:

(( تریفەو خدرو نارەوەن))

تریفە: ئەی ئێوە دانابەزن؟

نارەوەن: نەوەڵا دانابەزین بەخیل.. ئەزانی نیوەڕۆ کە وتتان لە دەرەوە نان ئەخۆین چەند حەزم لە خواردنی دەرەوە بوو؟ نەمویست دانیشتنەکەتان لێ تێکبەم، ئەگینا ئەهاتم.

تریفە: دانیشتنەکەی ئێمە دەسکەوتی تیا بوو کە هاتییەوە پێت ئەڵێم.

نارەوەن: دەی با خدر پێم بڵێ، جارێ من زۆرم برسییە.

تریفە: ئەی بۆ منیش نەیەم؟

نارەوەن(( نیمچە محاسبة)): تۆ نیوەڕۆ نانی باشت خواردووە، خراپە!

تریفە: ئەی حەمە خدر؟

نارەوەن: ئەوە دایکتە دایکت چۆن ئەهێڵم نانی باش بخوا.. دەبڕۆ باوانم ئاگاداری تیرۆژیش بە.

تریفە(( بە سوعبەتەوە دەم و لچ ئەدا بە یەکا)): دە بڕۆن عافێتتان بێ.(( دائەبەزێ))

نارەوەن: زوو دێمەوە ئاگاتان لە ماڵەکە بێ.

تریفە: خەمت نەبێ.

خدر: بڕۆین؟ یا قسەتان ماوە. ههه.

نارەوەن: تۆ بڕۆ، بزانم چی بوو؟ ئەو دڵەم وا ئەتەقێ!

(( ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٣٨٧ – ش / ن – ماڵی ئاوا:

(( نینا بێتاقەت.. ئاوا پارەیەکی زۆر ئەبژێرێ.. جاروبار چاوێک بۆ نینا بەرز ئەکاتەوە ))

**<u>نینا مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:</u>**

ئەترسم لە دەمی کەسێکیترەوە بیزانێ، یەکسەر تەڵاقمبا.. خۆشم پێی بڵێم ئەقەومێ.. ئەی خوا هاوار ڕوو لە کوێکەم؟ کێ بێت بە هانامەوە؟ ئای خوایە گیان فریامکەوی خۆت ئەزانی و ئاگات لێیە چەند پاکم لەگەڵ ئەم پیاوەما.. خوای گەورە بە گەورەیی خۆت بەزەییت پێما بێتەوە.

**<u>مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:</u>**

(( زەنگی تەلە فونی نینا دێت ))

نینا (( بێتاقەت )): بەڵێ؟!!! بەڵێ دایە گیان، ئێوە باشن؟ ............ نا هیچ......... تۆو کاک حەمەخدر دێن؟......... بەخێربێن سەرچاو........... دەستت ماچ ئەکەم زۆر سوپاستان ئەکەم.. یاخوا بەخێربێن....... بەڵێ باشە............... نا نا تا ئێوەدێن.. بەخێربێن یاخوا. (( مۆبایل دائەنێ )) دایکت و کاک حەمەخدر بەڕێوەن.

ئاوا (( پارەکان کۆئەکاتەوەو ئەیخاتە زەرفێکەوە )): بەخێربێن.. بەڵام سەیر نییە بەم شەوە؟

نینا: هەڵبەت ئیشێکیان هەیە.

ئاوا: دیارە.. بەڵام نینا یان من هیچ لە دنیا تێنەگەیشتووم؟! یان تۆ کێشەیەکی گەورەت هەیەو ئەوان بەدەم تۆوە دێن.

نینا: بۆ هەر ئەبێ من کێشەم هەبێ؟

ئاوا: بەساقە، ئەوەتای من تۆ ئەناسم بە تەعزێکەی باوک و براکەشتەوە، ئەوەندە نەترشابووی، خۆت بینیوە بەساقە چۆن ڕەنگت زەرد بووە.. ئینجا دایکیشم و کاک

حەمە خدریش تەنها یەکجار ماڵی ئێمەیان بینیوە، خێرە بەم شەوە دێن و بەمنیش ناڵێن، تەلەفون بۆ تۆ ئەکەن؟

نینا: چوزانم ڕەنگە تۆیان بۆ وەرنەگیرابێ.

ئاوا: بەساقە قسەکانیشت وەک پێشووتر بە ڕێ و جێ نیین.. توخوا ئەوە قسە بوو تۆ کردت؟ خۆ من کابرا نیم عەسرەخەو بکەم و دواییش بیرم بجێتەوە مۆبایل بکەمەوە؟

نینا(( گریان)): دە بوەستە بابێن، نەفرەت لەسەری کابرا.

ئاوا(( سەرسام)): ئای ئای ئای نینا گیان ئەوە ئەگریت؟ چی ڕوویداوە بەرخەکەم؟ بۆ نەفرەت لەسەری کابرا؟

نینا(( بە گریانەوە)): توخوا وازم لێ بێنە ئاوا گیان.. ئێستا دێن و هەموو شتێک ئەزانیت.

ئاوا: ئۆۆۆۆو یەعنی شتێک ڕوویداوەو لە منت شاردۆتەوە؟

نینا: ئاوا گیان نیازم بوو پێت بڵێم، تەلەفونەکەی دایکت ڕایگرت، ئەڵێ تۆ هیچ مەڵێ خۆمان قسەی لەگەڵ ئەکەین.

ئاوا: واوو دیارە شتێکی گەورە ڕوویداوە.. دڵم ئەیوت ئاوا چاوەڕوانی کارەساتێک لەو هەتیوەوە بکە، گاڵتەم پێی هات.. پەیوەندی بەوەوە هەیە؟

(( نینا سەر ئەلەقێنێ بە ئاماژەی بەڵێ))

گەڕانەوەی هەیە ________________ Cut ________________

دیمەنی – ١٣٨٨ – ش/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری ئامۆ:

(( دەوران و ئامۆ))

دەوران: بەڵێ بەڕاستی کەمتەرخەمن لە ئاستیا.. جا خۆ لەگەڵ منا وابن هەر سڵاویشتان لێ ناکەم، برای وام بۆچییە؟

ئاوا: من چی لێ بکەم دەوران گیان؟ ئەو خۆی شتەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردووەو ئێستا بە من جیا ناکرێتەوەو بیخەمەوە سەر ڕێڕەوی خۆی.

دەوران: نا کاکە پاساوم بۆ مەهێنەرەوە.. ئەی بۆ من بەم چەند شەوە زۆر باش لە هەموو شتێ تێگەیشتم؟ (( ئامۆ سەردائەخا)) ئەزانی بۆ؟.. چونکە بەڕاستی من وەکو خوشک لەگەڵیا دانیشتم و بە هەست و بە دڵ و بە ئەقڵم گوێم بۆ ڕاگرت.. بەڵام تۆ ناتوانی ئەوە بکەی، بەڕاستی پێت بڵێم نە تۆو نەئاواش شایانی ئەوە نیین برا گەورەمان بن.

ئامۆ: ڕاستت پێ بڵێم، نازانم چۆن هەڵسوکەوتێکی دروستی ئەوتۆی لەگەڵ بکەم، بە جۆرێک بێ دڵی ڕازیکا.. لەبەر ئەوە دوورەپەرێزییم هەڵبژاردووە، تا لێم زویر نەبێ.

دەوران: کورە ئەوە تۆ ئەڵێی چی کاکە؟ ئەگەر برا گەورەیی وەک ئەوەی تۆ بێ، منالێکیش ئەتوانێ برا گەورە بێ.. ئاخر پێم بڵێ تۆ چیت بۆ ئەو خوشکانەو تەنانەت بۆ براکەشت کردووە؟ هیچ!!!

ئامۆ: قسەکانت لە دڵیدام دەوران.. زۆر ڕاست ئەکەیت خەریکە ئەوانیش ئیتر سەر بە من نەمێننەوە.. بەڵێ هەست ئەکەم هەریەکەیان تەنیان بۆ چارەسەر کردنی کێشەیان.. سوپاس چاوەکەم، منیش ئەزانم وایە.. بەڵام..

دەوران: تو ئەو خوایە کاکە بەڵامی تێمەکە من زۆر لە دوای بەڵام ئەترسم، هەرچی هەیە بەو بەڵامە لەناوی ئەبەی هەه تکایە پاساو و بیانوو بۆ خۆت و بۆ هیچ کەسێک مەدۆزەرەوە.. ئەوەی پێموتی کەسایەتیی تۆیە لە خێزانەکەیا.. هەوڵی پینە کردنی مەدە، بەڵکو چاوێک بە خۆتا بخشێنەرەوە.

ئامۆ(( خەندە )): جا دەم درێژ تۆیان هەبی بەسیانە، ئەترسم ئەم قسانەت بۆ ئەوانیش کردبێ؟

دەوران: هەڵە مەکە کاکە ببورە وا ئەڵێم، من ئەگەر بەوانم وت، مانای وایە ئەمەوێ ئاژاوەتان تیا هەڵگیرسێنم.. ئەوەش کەسایەتیی من نییەو زۆرم پێ ناخۆش بوو وات وت.. بەڵام کە بەخۆتی ئەڵێم مەبەستم باشتر کردنی پەیوەندیی خوشک و برایانەمانە.

ئامۆ: دووبارە ڕاست ئەکەی، من گاڵتەیەکم کرد کە نەئەبووایە ئەوە بێ.. ببورە دەوران گیان.. تۆ ئەمڕۆ زۆر دڵخۆشت کردم بەوەی ڕووبەڕووی ڕاستییەکی زەقت کردمەوە.

دەوران: خۆت ئەزانی چەندم خۆش ئەوێی؟ پێویستت بە ڕوونکردنەوە نییە.. خەیاڵیش نەکەی هەر ئەمشەوەو تەواو، لێت نابمەوە تا بە حەق نەتکەم بە برا گەورەی هەمووان و ئەبێ هەموو شتێکیش بە پرسی خۆت بکرێ و تۆش زیندوو بی تیایا، نەک هەر بەڵێ باشەت لەسەر بێ، ئەوە نەک پرس نییە، بەڵکو پەراوێزخستنە با بزانی.

ئامۆ: هەستە با بچین بۆ لای تیرۆژ لای دایکتە؟

دەوران: نا لەوێ نییە درەنگ دێت، بەڵام بڕیاری پەلەش پەشیمانیی لەدوایە، جا باش بێ یان خراپ.. دانیشە دوو سەعات واز لە هەموو شتێک بێنەو بە خۆت و بە خێزانەکەتا بچۆرەوە.

ئامۆ: باشە ئەوەشت بە قسە ئەکەم، ڕاست ئەکەی.

دەوران: ئێستا پێم بڵێ.. کەی باشە ئێمەو باوکە تازەکەم لێرە دەرچین؟

Cut

دیمەنی – ١٣٨٩ – ش / ن – ماڵە لادێکەی ساماڵ – ژوورێک:

(( دلێرو ڕێبین و ساماڵ ))

ساماڵ: ئیتر من نازانم چییە، ئێوە بیر بکەنەوەو بزانین چیمانکردووە، وای کردبێ ئەو کچە متمانەی نەمابێ؟

دلێر: دڵنیابە هیچ هەڵەیەک ڕوونەداوە، ئەوەی خۆت وتووتە هەر ئەوە کراوە.

ساماڵ: خۆ من ئێوە تۆمەتبار ناکەم.. ڕەنگە ئەوەی من وتبێتم هەڵە بووبێ، بەدوای ئەوەدا بگەڕێن.

ڕێبین: تۆ برای ڕاماڵ نیت؟

ساماڵ: جا ئەوە چی تیایە؟

ڕێبین: چۆن چی تیایە؟ ڕەنگە شتێک لەو خۆشەویستییەی ڕاماڵا هەبووبێ، ئەم لە تۆشیا ببینێتەوە، بەوەش بیەوێ دوورکەوێتەوە.

ساماڵ: ئەو هاوسەرگیریی ئەوێ ڕێبین گیان، دوورکەوتنەوەی چی؟ دوای ئەوەش هەر سەرەتا ئەیزانی برای ڕاماڵم. نا ئەوەیان نا.. بەلام ئەڵێی ڕەنگە شتێکی هاوبەشی لە نێوانی تۆو ڕاماڵا بینیبێ، ئەوەیان زۆر ڕێی تی ئەچێ.

دلێر: ئەی کاک ساماڵ بۆچی بۆ ماوەیەک نایهێنی؟ هیچ نەبێ ئەو شتەی ناو کارگەکەشت پێ ئەڵێ.

ساماڵ: نا دلێر گیان، قەت ئەوە ناکەم، هەرچییەک بێ خاوەنی هەست و سۆزە، چۆن بتوانم دەستی ببڕم.. دوای ئەوە ئێستا کێ بێنم بۆ داوای؟

دلێر: دایک و باوکی من.

ساماڵ: نا بەساقەوبم.. ئەوە بەساختەچێتیی ناچێتە سەر، ئەی دوو ڕۆژیتر دلێر گیان؟

ڕێبین: کەواتە ئەبێ لێی دوورکەویتەوە.

ساماڵ: باسی ئەوەیان هەر مەکە مە!

ڕێبین: تۆ بڵێی لەم ماوە کورتەدا کەسیتری بنیات نەنابێ؟

ساماڵ: ڕۆڵە لەو کچانە نییە ئاسان بێ.

دلێر: نەوەڵا هەر سەیری ئەکەی ئەزانی چەند سەنگینە.

ساماڵ: داوای هاوسەرگیری ئەکا ((سێ پەنجەی زەڕنەقوتەو دۆشاومژەو ئەسپێ کوژە ئەهێنێتەوە یەک و بەسوکیی ئەیکێشێ بەسەری ڕێبینا، وەک ئاماژەی بێ ئەقڵیی)) هاوسەرگیریی، تێئەگەی هاوسەرگیریی یەعنی چی بێ مێشک؟

ڕێبین: دە ئا ئا بۆ تێناگەم؟

Cut

دیمەنی – ١٣٩٠ – ش/ن – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٨٧ – ماڵی ئاوا:

(( خدرو نارەوەنیش هاتوون.. دەنگە دەنگێکی زۆرو چوونی دایالۆگەکان بە یەکتردا.. گریانی بەردەوامی نیناو تووڕەیی زۆری ئاوا.. ڕەسمەکان لەبەر پێیاندا کەوتووە))

ئاوا(( خدر گرتوویەتی)): قەبری ئاژدادی ئەسوتێنم، چۆن یاری بە ناوبانگی منەوە ئەکا؟

نارەوەن: دانیشە بە قوربان باچارەسەرێک بدۆزینەوە، بە هاتوهاوار نابێ کوڕم.

خدر: هێمن هێمن کاکە ئاوا تۆ کەی وابوویت؟

(( دایالۆگی خدرو نارەوەن و گریانی نیناو بەرمدەی ئاوا بە یەکەوە ئەبیسترێ))

ئاوا: بەرمدە کاک حەمە خدر، بیللاهی ئەمشەو ئەو سەگبابە نەکوژم خۆم ئەکوژم.

خدر: تکایە تکایە کاکە ئاوا خۆ ئێمە بۆ ئەوە پێمان نەوتی وابکەی؟

نارەوەن: کوڕم لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە، قەتڵێکیش بەسەر خۆتا ساغمەکەرەوە.

نینا(( بە گریانەوە)): وەڵا با بیکوژێ.

ئاوا(( بۆ نینا)): تۆ هەر قسە نەکەیت و دەم هەڵنەهێنیتەوە ئاژدادت بسوتێنم، حسابی تۆ دواییە.

خدر(( تووڕە ئەبێ)): ئەرێ دە بەسەو گوێمان لێ بگرە.. ئەگەر بەڕاستتە ئەیکوژی فەرموو.. تۆ هەر نازانی شوێنەکەش لە کوێیە.. ئێمەش بۆ ئەوە هاتووین بیگەیەنین بەسزای خۆی، بەڵام بە دەنگە دەنگ نا.. ئەوان بە بێدەنگیی ئیشی خۆیان کردو ئەوەتا مەرج بەسەر منا ئەسەپێنن نەک خۆت و ژنەکەت.. دە گوێ بگرە ئیتر.. ئای ی ی ی !

ئاوا(( هێمن ئەبێتەوە)): ببورن ئەعصابم زۆر گەرمە تکایە.. خێرا پێم بڵێن چی بکەین لەو سەگبابە ڕزگارم بێ؟.. بە هەموو دنیایا بڵاوی ئەکەنەوە، نابێ ئەوە ڕووبدا، مەگەر ئەم تەڵاقبەم.

نارەوەن: ئەوە چ ناماقوڵییەکت کرد؟ حەددت چییە تەڵاقی ئەدەی؟ ئەم گوناحی چییە؟ داوەو بۆمان چنراوەو ئەبێ چارەسەری بکەین، نەک بیشێوێنین.

ئاوا: دەی حەیامان بچێ باشە نارەوەن خان؟

نارەوەن: ئەی ئەم داماوەش چی کردووە ببێتە قوربانیی بۆ پیلانی خەڵک؟

خدر: گوێم لێ بگرن تکایە، نە نیناش تەڵاق ئەدرێ و نە حەیاشمان ئەچێ و نە ئەوانیش قوتاریان ئەبێ.. تەنها گوێ بگرن بزانن پێویستە سەرەتا چی بکەین؟

نارەوەن: فەرموو.

خدر: نینا گیان تۆ ئەو ماڵە ئەزانی کە لەگەڵیا چووی؟

نینا: بەڵێ بگەمە ئەو دەوروبەرە ئەیدۆزمەوە.

خدر: هەرچەندە لەو بڕوایەشدا نیم لەوێ مابێ و چاوەڕوانی ئێمە بکا؟! بەڵام سەرەتا بچین بۆ ئەوێ و دواتریش بۆ ماڵی باوکی ئەگەر ئەیزانی؟

نینا: بەڵێ ئەوەیان باش ئەزانم، چەندجارێک لەگەڵ باوکما چووم.

ئاوا: بەڵام کاک حەمەخدر من ئەیکوژم.

خدر: جا کە کوشتت براکەم، هەموو وێنەکانیش بڵاو ئەبنەوە.

ئاوا: ئەی چی بکەین لێیگەڕێین؟

خدر: نا، ئەوە کاری لێگەڕان نییە.. یەکەمین شت ئەبێ بگەینەوە بەو کامێرا یان مۆبایلەی وێنەکانی پێ گیراوە، بۆ ئەوەی ئەوانە بنبڕ بکەین، دواتر بزانین مەرجیان لەسەر من چییە؟ ئەوسا لە چۆڵەوانیەکا ئەیدەمە دەستتەوە، چی لێ ئەکەی بیکە.

ئاوا: باشە، قسەکەی تۆیە ئەبێ پێشتر ئەوانە بکەین.. دەی هەستە پێشمان کەوە کەپڵەکەی کوڕە ناسکەکە.

نارەوەن: کورم مەعز بۆ ڕجای خوا، تیروتانەی تێمەگرە.. بەخوا هەڵەی ئەم بووایە دەستم ئەخستە تیتکی، بەڵام ئیتر ئەمیش چیبکا؟ چوزانێ گورگی واش هەیە؟ خۆشت بە دڵە پاکەکەت تێنەکەوتووی؟ ئیتر لۆمەی ئەم بۆ ئەکەی؟ هیچی بێ پرسی خۆت نەکردووە.

خدر: کاتی قسە نییەو درەنگە با بڕۆین.

نارەوەن: ئەی بۆ من بە پێ نەچمەوە ماڵەوە؟ ئەو کچانە تەنیان.

خدر: نا وەرەو لەوێوە ئەڕۆین، تۆش بە تەنیا مەڕۆ.

ئاوا: نەوەڵا تاقەتی بەزمێکیتریشمان نییە.

(( هەموو ئەچنە دەرەوە))

—— تابع —— Cut ——

دیمەنی – ١٣٩١ – متبوع – ش/ د – ناو سەیارەی خدر:

(( بە سەیارەی خدر، نارەوەن و خدرو ئاواو نینا، ئەگەنە بەر ماڵەکە.. سەیارەکە سوکی ئەکاتەوەو ئاوا بە پەلە خۆی هەڵئەداتە خوارەوە، خدر بە پەلە ڕایئەگرێ و ئەویش بە پەلە خۆی فڕێ ئەدات و دوای ئاوا ئەکەوێ.. کە ئەچنە پێشەوە، قطعەیەک بە دەرگاکەدا هەڵواسراوە لێی نوسراوە " ئەم خانووە بە هەموو پێداویستییەکەوە بۆ کرێ.. بۆ بەکرێگرتنی.. پەیوەندیی بکەن بە نوسینگەی هەرزاڵیانەوە "

ئاوا (( تورە )): ئەوە خۆ سەگبابە هێناویەتی بۆ خانووی کرێی ڕاخراو.

خدر: پێشبینیی ئەوەم ئەکرد.. چۆن ئەیباتە خانوویەکەوە بناسرێتەوە.

(( نارەوەن و نیناش دائەبەزن و دێنە لایانەوە ))

ئاوا: من بەیانی ئەگەمە سەر ئەو نوسینگەیە بۆ دۆزینەوەی ناو و ناونیشانی.

خدر: ئەوەشیان باوەڕ ناکەم هیچی لێ سەوز بێ.. ڕەنگە ناسنامەی ساختەی دابێت بە نوسینگەکەش.

نارەوەن: هیچتان دەست نەکەوت؟

———— تابع ———————— Cut ————————————

دیمەنی – ١٣٩٢ – متبوع – بەردەرگایماڵێک:

(( خدرو نارەوەن و ئاواو نینا لەگەڵ ڕزگاری مام فەریقی سەعاتچیدا وەستاون.. بە تەمەنە))

ڕزگار: بەڵێ شەپۆل لەماڵە (( بانگی ئەکا))

نینا: بەڵام مامە ڕزگار ئەو وتی جەنابت کوژراوی و نەماوی؟!

ڕزگار: بەخوا نینا گیان باوەڕ ناکەم شەپۆلی من بووبێ، چونکە ئەو قەت درۆ ناکا.. ئەوەتا ئەشمبینی ماوم.

شەپۆل(( کوڕێکیترە لەو شەپۆلیتر مناڵتر)): بەڵێ باوکە(( بەخێرهاتنی ئەوان و وەڵام))

نینا: نەوەڵا ئەم نەبوو بابە، ئەو گەورەتریش بوو.

خدر: دەی کەواتە ببورن عەزێتماندان.

(( خوڵق کردن بۆ ماڵەوەو سوپاسی خدرو نارەوەن و ئاواو نیناو خواحافیزییان))

Cut

دیمەنی – ١٣٩٣ – ڕ / ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش:

(( نیگارو نازەو دەوران))

نیگار: ئا.. بەیانی دەرئەچین.

نازە: بەسەرچاو.. ئەمڕۆ ئەچم ماڵەکە پاک ئەکەمەوە.. وا بزانم هیچی وای لێ نەماوە.. بزانم هەرچییەکمان پێویست بێ لای عەسر دێمەوە پێت ئەڵێم.

دەوران: ئا وەرەوە بە من بڵێ بە فڕکانێک ئەچین ئەیکڕین.

نازە: بەسەرچاو دەوران خان.

نیگار: ئەگەر بتوانی ئیزنی ماڵەوە وەرگری وچەند شەوێکیش بمێنیتەوە، زۆر باش ئەبێ کچەکەم، تا بزانین چۆن لەگەڵ ئەم بەزمەشا ڕادێین.

نازە: پێیان ئەڵێم نیگار خان بەسەرچاو، بەخوا ئەوانیش زۆر بۆت بە پەرۆشن، دایکم هەزار دوعای خێری بۆ کردووی.

نیگار: جەرگی نەسوتێ بەساقەی بم، سوپاسی ئەکەم.

نازە: دەی با من بچم فریاکەوم.

نیگار: ئا بەقوربانی نازە گیان بم. (( ڕۆشتنی نازەو خواحافیزیی)) ئەرێ دەوران گیان عەرەبانەت بۆ من و باوکت ئامادە کردووە؟

دەوران: جارێ کاتی عەرەبانەتان نییە، خوا ئەکا ئەگەنە ئەوە، شتی زۆر جوان هەیە.

نیگار(( بێزاریی)): ئۆف خوایە، ئەی نالێن کەی هەڵئەسینەوە؟

Cut

دیمەنی – ١٣٩٤ – ڕ / ن –ماڵی ئاوا:

(( ئاوا تیشێرت و پانتۆڵی لەبەرەو چاکەت ئەکا بە سەریا، نیناش خۆی گۆڕیوە بچن بۆ کۆمپانیا ))

ئاوا: ئەوە بۆ کوێ وا خۆت لە تەل داوە؟

نینا: تەلی چی هەر جلی ئاسایی ڕۆژانەم نییە؟

ئاوا: بچۆ ملت بشکێنەو ئەو جلانە دانێ، ئیتر تۆ بە هیچ جۆرێک دەرەوە نابینی.

نینا: بۆ ئاوا گیان؟ بیللاهی هەڵەم نەکردووە، بۆ دەرەوەم لێ قەدەغە ئەکەی؟

ئاوا: یەکجار قسە ئەکەم، ئەگەر هەر زۆریشت حەز لە دەرەوەیە، ئەتوانی هەموو جلەکانت ببەیت و بچیتەوە ماڵی پورە گێلاست.

نینا: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ بیکە بەڕای خوا ئاوا گیان، گەورەی مەکەرەوە، ڕێم بدە با منیش بێمە دەرەوە بەڵکو ئەمە خوایە لە سوچێکەوە سۆراخێکیم دەستکەوێ.

ئاوا: هەی گێلی کچی گێل، ئەو ئەوەندە زۆڵ بێ خۆی لێکردبی بە کوڕی هاوڕێیەکی باوکت و خانووی ئامادەی بۆ دوو ڕۆژ بە کرێ گرتبێ بە پێناسی ساختەوە، ئێستا هیچ ناکا دێتەوە بەردەمت و ئەڵێ هەر ئەمرێکت هەیە لە خزمەتدا بم؟ کەرە کەر مەکەو وەک وتم تا ژنی من بیت دوو پێت ناچێتە ئەو دیوی دەرگای دەرەوە بۆ سەوزە کڕینیش.

نینا: ئاواااا.

ئاوا: ژەهری هەلای هەل.. ماوتە ئابڕووم بەری.. بێدەنگبەو لەسەری مەڕۆ با بڕیاری خراپتریش نەدەم، کە هەر ئەبێ لە داواییدا ئەو بڕیارەش بدەم.

نینا: تەڵاقم ئەدەی ئاوا؟ (( ئاوا پشتی تێ ئەکاو بە تووڕەیی ئەچێتە دەرەوە)) ئاوا.. ئاوا !!

Cut

دیمەنی - ١٣٩٥– ڕ / ن –کۆمپانیای تازە:

(( دیدەوان لەسەر مێزی نارەوەن دانیشتووەو ڕێبوارو تافان لەوێن))

دیدەوان: ژمێریاریی ئەزانی؟ پێناسەکەیت هەیە؟

تافان: مەگەر یەکێک فێرمکا، ئەگینا زۆر سەری لێدەرناکەم.

دیدەوان: حەزت لە چ ئیشێکە؟

تافان: هەرچییەک جەنابت ئەمری پێ بفەرمووی.

دیدەوان(( بۆ ڕیبوار)): باشە با هەبێت.. لە ژوورێک دانیشێت و هەر ئیشێکی لابەلامان هەبوو، پێی ئەسپێرین.

ڕێبوار: گەورەم بەیانی ئەمیش لەگەڵ ئەوانیترا ئەڕوا.

دیدەوان: دەی کەواتە سەرکێشیشی خانمە جوانەکە!!؟

تافان: ئەمرت بە هەرچی بێ ئەوە ئەکەم.. من شانازیی ئەکەم بتوانم خزمەتێکی بچووکتان بکەم.

دیدەوان: ڕێبوار با ئەم گوڵە بۆ کۆمپانیاکە بێت.. ئەگەر خۆی حەزی لە گەشتەکەی بەیانیش نییە، ئەتوانێ نەچێت.. لای خۆمان ئیشی زیاتری ئەدەینێ.

ڕێبوار: گەورەم خۆی ئەیزانێ، ئەوەندەی بزانم دەسکەوتەکەی بەلاوە گرنگە.. خۆت ئەڵێی چی؟

تافان: بۆ من ئاساییە بچم، هەرچییەکیش ئێوە پێتان خۆش بێ، با ئەوە بێ.

(( خدر دێتە ژوورەوەو لەبەرهەستان و تەوقە لەگەڵ دیدەوان و تعارف لەگەڵ ڕێبوارو تافان.. تافان زۆر ئەشڵەژێ و کەمێک خۆی دوور ئەگرێ))

دیدەوان: جا خۆ گەر بشکوژرامایە هەر ئاوا لێت ئەپرسیم برادەر؟

خدر: نا بەو هیوایەی هیچ ڕووینەدابێ و سەلامەتیشت مەبەستمانە کاک دیدەوان.

دیدەوان(( بۆ تافان و ڕێبوار)): دەی ئێوە ئەتوانن بچنە ئەودیو، مەڕۆن با بتانبینمەوە.

ڕێبوار: سەرچاو (( تافان و ڕێبوار ئەچنە دەرەوە))

دیدەوان: گەیشتینە کوێ کاک حەمەخدر؟ نارەوەن بۆ وا سەر کەلی شەیتانی لێگرتووین؟

خدر: من نازانم چۆن ڕێککەوتوون؟ هیچی پێ نەوتووم!

دیدەوان: ئەڵێ نایەمەوەو کۆمپانیاکەشم لێوەرگرنەوە.. بەڵام خۆت ئەزانی کۆمپانیا لەسەر ڕێککەوتنی ئێوەو ڕەمزی دانراوەو نە تۆو نە نارەوەنیش پابەند نەبوون بە بەندەکانی ڕێککەوتنەکەوە.

خدر: کۆمپانیا وەک متمانە بە ناوی خۆتەوە تۆمار کراوەو ڕێککەوتنەکەش هەر بە ئیمزای تۆیە.. کەواتە با لە ئێستاوە من و تۆ ساڵەکە تەواو بکەین.

دیدەوان: نا نا.. کاکە حەمە گیان.. وا باشە نارەوەنیش بێتەوە.

خدر: ماوەیەکی بدەیتێ تا هێمن ئەبێتەوە، جارێ ڕقەکەی ڕەمزی بەری نەداوە.. ئەوی گرنگە بە منی بسپێرەو خەمت نەبێ.

دیدەوان: هەندێ زانیاریی زۆر گرنگم داوەتێ.. خۆزگە وەک ئەم قاسەیە وا بووایەو زانیارییەکانم دەربهێنایەتەوە.. بەڵام ئەو قاسە نییە کاکەی من. خۆ لەوە تێئەگەی؟

خدر: بەڵێ زۆر ڕەوان تێت ئەگەم.. من کەفالەتی ئەکەم کە هیچ یەکێ لەو زانیاریانە نەچێتە دەرەوە.

دیدەوان: تۆ پیاوێکی ئاقڵی هەرچەند وەک بیستوومە بڕوانامەت نییە.. بڕوانامەش ئەقڵت ناداتێ.. من زۆر گرنگیت پێ ئەدەم و ئەزانم شتی زۆر هەن بە تۆ نەبێ، بە کەس ناکرێ.. بەڵام پێم بڵێ، کەفالەتی تۆ بەسە؟

خدر: ئەگەر ژیانم بکەم بە بارمتەی کەفالەتەکە؟؟؟؟؟

دیدەوان: بەڕای من بەس نییە، لەبەرئەوەی من ژیانی تۆم لا مەبەستەو ئەبێ بمێنی.. تەنها شتێک بۆ ئەوەی توشی هیچ جۆرە سەرێشەیەکمان نەکا، گەڕانەوەی نارەوەنە.. وتت چی؟

خدر(( بیرکردنەوە)): هەوڵی لەگەڵ ئەدەم.

دیدەوان: خوانەخواست بە هەڕەشەی تێمەگە.. بەڵام گەر ئەو ژنە نەیەتە ئەو ئیشەوە، من بەردەوام لە دڵەڕاوکێدا ئەبم.

خدر: باش تێ ئەگەم.. کەواتە دەستپێکردنی ئەو ئیشەی بەوت وتووە، بیهێڵەرەوە، تا بتوانم ڕازیی بکەم بێتە ناو ئیشەکەوە.

دیدەوان: ئەوە قسەی پیاوە!

Cut

دیمەنی – ١٣٩٦ – ڕ / د – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا خەریکی ڕسمی هەندەسییەو پاش کەمێک سەرچڵ دێتە ژوورەوە، دوای سڵاوی هاکەزایی))

سەرچڵ: قوربانی تۆ، ئادەی بزانم چیت بۆ کردووم؟ بەس ڕزگارت کردبم لە دەستی!

شەنیا: ئاسانە هەتیو کەی وابووی؟ بەخوا ئەگەر وابێ پیاو زۆر گوناحن.

سەرچڵ: شەنە گیان بە هیچ لێم نابێتەوە.. زۆر ڕێگەم لەگەڵا بەکارهێنا، هیچ سوودی نییە، ئێستا ئەڵێ ئەم ئیشە کرا ئیتر ئەبێ بمهێنی.

شەنیا: هاهاها تۆش وتت بەڵێ بەسەرچاو.

سەرچڵ: ئەی خۆ نایکوژم؟ بڵێم چی؟

شەنیا: کە گەمژەی خوای گەورە هههه؟!.. پێی بڵێ کە هاتەوە، یەکسەر بێتەوە بۆ لای تۆ.. زیاتر لە کوێ دائەنیشن؟

سەرچڵ: هەر شوێنێک بێ جیاوازی نییە!

شەنیا: دێتەماڵەوە؟

سەرچڵ: نا.. ئیتر لەناو سەیارەو پارک و قاوەخانەو ئاوا.

شەنیا: ناوی قاوەخانەیەکی بدەرێ بێتە ئەوێ.. من لە ڕێگەی شۆفێری مینی پاسەکەوە ئەزانم کەی ئەگەنەوە شار.. ئەو کاتە لەوێبەو منیش کچێکی هاوڕێمت بۆ ئەنێرم، کە ئەوی لەگەڵتا بینی، دنیا بێنێتە سەیرت کە چۆن ناپاکیت لەگەڵ کردووەو لەگەڵ کچێکیتر دائەنیشی؟

سەرچڵ: ئەی خۆ من ئەو کچە ناناسم!

شەنیا: کورە تۆ زۆر خراپت بەسەرهاتووە، ئەوە بۆ وا گێژی کردووی؟

سەرچڵ: گێژی چی شێت و وێت؟ ئەی من چوزانم کێیە؟

شەنیا: دەماغسز، قابیلە ئاوا لێتگەڕێم؟ ئێستا ژمارەکەیت ئەدەمێ و من قسەی تەواوم لەگەڵ کردووە.. شەو ئەیبینیت و پیاسەیەک بکەن، خۆم هەموو شتێکم تێگەیاندووەو پارەشم داوەتێ. (( بە لاسایی کردنەوەوە)) من نایناسم!!!! دەرد.

سەرچڵ: ئەی من چی بڵێم ئەو کاتە؟

شەنیا(( توڕە)): تۆ بڵێ ژەهری مار!! یەعنی نازانی چۆن خۆت دەربازکەی؟

سەرچڵ: نەوەڵا.

شەنیا((بزە)): وەی دەرد، چەند خۆش ئەڵێ نەوەڵا هههە.. بە هاوڕێکەی من بڵێ، بە هەڵە تێگەیشتووی ئەم خاڵۆزامەو کێشەیەکی خێزانیمان هەیە.. ئەوسا دڵنیا خۆی جێتان ئەهێڵێ و باوەڕ مەکە بە ژیانت بیبینیتەوە.

سەرچڵ: ئەی خۆمان ئیشیترمان پێی نابێ؟

شەنیا: خەمت نەبێ، ئەیهێنمە لای خۆم.. با تۆ ئیشی پێ نەکەیت و من پێی بکەم، خۆ کابە کەچ نابێ؟ هههە ئیش هەر ئیشە.

سەرچڵ: بەخوا باش تێنەگەیشتووی شەنیا.. ڕەنگە لەو قاوەخانەیەیا دەست بدەنە قژی یەکتر، تۆ نازانی چۆن هۆگرم بووە؟

شەنیا: نا نا ئەوەندەش قۆز نیت کچان شەڕت لەسەر بکەن هههە.

سەرچڵ: ئەی ئەگەر کردیان بە دەنگە دەنگ.. چی بکەم؟

شەنیا: چی ئەکەی؟ ڕێک و باریک بچۆرە دەرەوەو هەردووکیان جێبێڵە.. خەمت نەبێ ناوبژیوانی کچان زۆرن هههە.

Cut

دیمەنی – ١٣٩٧ – ڕ – د – چایخانەکە:

(( لەتیف بە گۆچانێکەوە لە چایخانەکە دانیشتووە.. کارە بە تەنیشتییەوە لە سەرپەڕ، هاوڕێ چا ئەبا بۆ دوکانەکانیتر، ڕەوەز بەوێدا تێپەڕ ئەبێت و لە لەتیف نزیک ئەبێتەوە، کارە گوێ بۆ قسەیان هەڵئەخاو ئاگای لە چاودێریی جادەکە نامێنێ))

ڕەوەز: ئەوە نەچوویتەوە سەر کارەکەت کاک لەتیف؟

لەتیف: نەوەڵا ڕۆڵە کاری چی؟ تەواو من پەکم کەوت، ئیتر هیچ ئیشێکم پێ ناکرێ.

ڕەوەز: ئەزانم ئاوا بەخێوت ئەکا، تۆش باش دڵسۆزی بووی، هەرچی هەبوو و نەبوو خستتە چنگیەوە.

لەتیف: بەخوا ڕۆڵە من دەرەقەتی شەڕی ئەژدیهاکان نایەم و خۆم لە قەرەیان نادەم.. هیچ مەکە ئاوا پێویستیی بە منە شتێکی پێ بڵێم یا نەڵێم.. تۆزێ ئەقڵت کۆکەرەوە کوڕم.

(( سەیارەیەک لە دوور ئەوەستێت و یەکێک بە خۆگێلکردنەوە دائەبەزێت و دێتە نزیکیان و لەسەرپەڕ دائەنیشێت..داوای چایەک ئەکات و هاوڕێ لەو کاتەدا دێتەوەو بۆی ئەهێنێ.. کەسەکە نامەیەک بە نهێنیی دەرئەهێنێت و لە پشتی خۆیەوە فڕێی ئەدات))

# (( ئەڵقەی شەست و حەوت))

ڕەوەز: ئاگاداری هەموو شتێک بووم کاک لەتیف، ئەوەش خوای من وا خەریکە زەلیلی جێگات بکا، ئیشەڵا ئەوەشت نامێنێ و بۆ قومێک ئاو بکرێ بە دەمتەوە دەستی پەنجا ماچ ئەکەی.

لەتیف: خوا بە دڵی خۆت لەگەڵ بکاو لەگەڵ هەمووانیش.. بڵێم چی؟

(( کەسەکە بە پێچەوانەی سەیارەکەوە بە لاکەیتردا ئەڕوات و سەیارەکە دێت و لەو تێپەڕ ئەبێت و لە پێشتر چاوەڕوانی ئەکا))

ڕەووەز: ئەی قابیلە بە دڵی تۆ لەگەڵ منا بکا؟

لەتیف: وەزعم زۆر باش نییە سەرم گێژ ئەخوا کاکە ڕەووەز، بە یارمەتیت.

Cut

دیمەنی – ١٣٩٨ – ڕ / د – ژووری لای سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و شەنیا ))

شەنیا(( پەشیمانیی دەربڕین)): ئاخر دەتوخوا سەیریکە ئێمەش چەند پەلەمان کرد، هەر نەمانکرد پێش کوشتنەکەی شوێنی پارەکانی لێ بپرسین، ئاااای خوایە!

دیدەوان: کچم ئەو تۆی نەکردبوو بە ژمێریاری گروپ.

شەنیا: نا کاک دیدەوان، وتی ئەتکەم بە ژمێریار، نەیکردبووم.

دیدەوان: لای من وتی شەنیام کردووە بە ژمێریارو خۆم نامپەرژێ، پارەشی پیا ناردبووی بۆ ڕامالەکەی کە کوشتی.

شەنیا: تۆ بڵێی درۆت لەگەڵا بکەم کاک دیدەوان؟

دیدەوان: نەوەڵا ئەزانم ئەوە پارەیەک نییە بە قوڕگی کەسا بچێتە خوارەوەو لەبەر بینی ئەگیرێ، بەڵام ئیتر ئەو وای پێوتم.

شەنیا: ئەسڵەن پارەکەی باوکمی دایەوەو ئەوەندە زۆرە تا بمێنم پێویستیم بە هیچ جۆرە پارەیەکیتر نییە.. وەک خۆشت ئەڵێی، نەوەڵا کاکە ئەو پارەیە بە قوڕگی کەسا ناچێ، ئەوەی ئەو باسی ئەکرد خەیاڵییە.

دیدەوان: ئەی ئەو پارەیەت لە کوێ دەرکرد کە بردت بۆ ئەو هەتیوە؟

شەنیا: هەقتە گومان لەوە بکەی.. بەڵام هێنابوویە کارگەکەو پاش دەوام بۆی خستمە سنوقی سەیارەکەوە، ئیتر لە کوێ هێنابووی و نەیهێنابوو، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ.

دیدەوان: ئەو پارەیە هی کەسمان نییەو هی هەمووشمانە شەنیا.. مادام وەکو ئەڵێی بە نیاز بووە بتکا بە ژمێریار، باش بیر بکەرەوە ئاماژەیەکی کردبێ بۆ شتێک کە بمانخاتە سەر شوێنی پارەکە.. ئەگینا هیچمان بە دەستەوە نامێنێ و نابووت ئەبین.

شەنیا: وەڵا خۆ ئەوە ڕاستە، بەخوا ئەمشەو لە داخا خەوم لێ نەئەکەوت، ئەمووت بۆ ئەو هەڵە گەورەیەمان کرد.. (( زەنگی بۆ دێت)) ساماڵە، بە یارمەتیت.

دیدەوان: فەرموو.

شەنیا: ئەلو! بەڵێ............... لای مامم ساماڵ گیان کەمێک نەساغە، تۆ لە کارگە بە، دێمەوە، زۆرم پێ ناچێ.......... بای.

دیدەوان: گەڕایەوە؟

شەنیا: بەڵێ دوێنێ.

دیدەوان: ئەوەش هەر باشە.. کەواتە ئەبێ زوو خۆکەوین ئەو پارە شاراوەیە بدۆزینەوە، خۆ بە گیرفانی بەتاڵەوە دەست نادەینە ئەو ئیشە قەبەیە؟

شەنیا: هەوڵی دنیا ئەدەم کاک دیدەوان، نابێ ئەو پارەیە تیاچێ، ئەوە بناغەی گروپەکەیە.. بەڵام ئەگەر وا زوو نەدۆزرایەوە، من هەموو پارەی خۆم ئەهێنم، بەڵام ئەوسا بەشم ئەوێ.

دیدەوان: بەشی چۆن؟

شەنیا: بۆ نمونە ٢٠%.

دیدەوان: کەواتە منیش پارە بێنم ٢٠% ببەم و ٥٠%یش بۆ گروپ ئەی چی ئەمێنیتەوە بۆ ئەوانیتر؟.. بە تایبەت ئەو مافیا گەورەیەو خدرو نارەوەنیش.

شەنیا: پێشم ناخۆشە ئەوە ئەڵێم، بەڵام برادەرانی خۆمان هەر هەموو ئەڵێن ئەگەر بەشی گروپ نەکرێ بە ٢٠% ئیش ناکەین و جێتان ئەهێڵین.

دیدەوان: ئۆو!!!! کەواتە یاخی بوون هەیە؟!

شەنیا: نا، ناوی مەنێ یاخیبوون.. بەڵام داواکارییە.

دیدەوان: باشە.. تا کەمێ خۆ ئەکەوم و لەبری هەر یەکێکیان پێنج ئەهێنم، قیروسیا، با جارێ وابێ. ________________ Cut ________________

دیمەنی – ١٣٩٩ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو تریفەو نارەوەن ))

تریفە(( تورە )): نەوەڵا قەت وانییە، ئەوە درۆ ڕێکخستنێکی پەتییەو هیچیتر.. ئێوە لە ئاوی مەنگ بترسن، ئاوی مەنگ.. ئەو چەتیوەش زۆر مەنگە.

نارەوەن: دەمت داخە با بۆت نەکوتمەوە. چاوت دەردێنم گومان لە نینا بکەی ها!!!

تریفە: هەربە بەدەمییەوە عاقیبەتت خێر ئەبێ ئیشەڵلا.

نارەوەن(( تورە )): تریفە با هەڵنەسم بۆت بیبڕەوە.

خدر: تریفە زۆر دڵنیابە هەڵەیت.. نینا پاکەو ئەم داوەش بۆ من چنراوە نەک بۆ ئەو.. با بزانی من هەر لەبیری ئەوەدام چۆن بتوانم ئەو ڕزگارکەم، باوەڕکە خەمی خۆمم نییە، بەڵام ئەو ناسکە بەرگە ناگرێ و ئاواش لە تەقینەوەدایە.. یەک قسە لەوانەی تۆ ببیسێ، تەلاقی ئەدا.

نارەوەن: ئەی ئەوە نییە دەرەوەی لێ قەدەغە کردووە.. وەڵڵا گوناحی ئەگا.

خدر: نا نا.. جارێ ماڵەوەی باشترە نارە گیان، من لەگەڵ ئەوەیدام.. ڕەنگ بە ڕوویەوە نەماوەو زیاتریش تێک ئەشکێ.. با یەکێکیش قسەیەکی لەسەر نەکا، خۆت نازانی خەڵک چۆنە؟

نارەوەن: بەرەوەڵا ئەزانم کە بارت کەوتە لێژیی، کەس خاست نایەژی.. ئەوە نییە بەس کچەکەی خۆم بیستوویەتی، لەخۆیەوە دایئەگرێتەوە؟

(( کارە دێتە ژوورەوە ))

کارە(( پاش سلاوێک )): کاک حەمەخدر ئەم نامەیەم لە دەرەوە دۆزییەوە ناوی جەنابتی بەسەرەوەیە.

خدر: لە کوێیا دۆزیتەوە؟ ئا بێنە!

کارە: وەڵا کە هەستام کەوتبووە ژێر کورسییەکەمەوە.

خدر((ئەیکاتەوەو کەمێک شڵەژان)): ئەک عەمرت نەمێنێ یاخوا، باشە؟ .. من وتم ئاگات لە جادەکەش بێ، کەچی تۆ ئاگات لەژێر قنگی خۆشت نەبووە؟ ئەی من تۆم بۆچی لەوێ داناوە؟

کارە: وەڵایی چاوم لەو جادەیە نەتروکاندووە. بڵێم چی هاتبێتە تەنیستمەوەو خستبێتیە ژێر کورسییەکەوە.

خدر: دە بڕۆ دەرەوە ملت بشکێنە، دوایی چارەسەرت ئەکەم.

(( خدر نامەکە ئەخوێنێتەوە))

گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ١٤٠٠ – ڕ / ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژو ئامۆ))

ئامۆ: باشە تیرۆژ گیان.. من خەڵکت بۆ دائەنێم نەهێڵێ لە هیچ شتێک پەکت بکەوێ، لە هەر وڵاتێکیش ویستت، لەوێوە کەرەستەکانت بۆ بێنێ.

تیرۆژ: قوربانت بم کاکە گیان.. ئەرەوەڵا تەواو چوار دیوارەکەم لێ بێزراوە، هەر بچمە دەرەوە خۆشە.

ئامۆ: خەمت نەبێ، هەر بەیانی لە ماڵەوە ئەبی.. دوو بەیانی بچۆ بۆ چاپخانەی خۆت و ئیش وەرگرە.. لە یەکێک لەو کۆمپانیا پرۆدەکشنانە ڕیکلامی باش ئەکەین.

تیرۆژ: ئەرێ ئاسمان کۆڵەکەی ناوێ کاکە؟ هاهاها.

ئامۆ: تێت ئەگەم باوانم، نا لەمەودوا نەک هەر لەگەڵ تۆ، لەگەڵ هەمووتانا بەشدار ئەبم لە بچووکترین بیرکردنەوەتاناو وا ئەکەین ئێوە ئاسوودە بن، بە تایبەتی تۆو ترێ گیان.

تیرۆژ: زۆر دڵت خۆشکردم، زۆر سوپاس، خوا بۆ ئێمەت هەر بهێڵێ.

Cut

دیمەنی – ١٤٠١ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاوا زەنگی بۆ دێت و وەڵام ناداتەوە، ناوی نینا لەسەر شاشەکەیە.. پاش کەمێک زەنگ نامێنێ و ئاوا هەر تەماشای تیڤی ئەکا.. مسکۆڵێکی بۆ دێت))

ئاوا(( تێل ئەکا)): چییە ڕاستتە کاک ئاکۆ مردووە؟ یان فێڵێترە بۆ چوونە دەرەوەت؟

نینا(( دەنگ و کەمێک توڕە)): ئەتوانی خۆت بزانی ڕاستە یان نا؟ بەڵام ئاوا گوێبگرە، من ناتوانم تاسەر بەمشێوەیە لەگەڵتا بژیم، کە گومانت لە هەموو شتێکم هەبێ.. خۆت یەکلاکەوە تاقەتم چوو. (( مۆبایل دائەخاتەوە))

ئاوا(( تێلی بۆ ئەکاتەوە)): خۆت نەچی، ئێستا خۆم دێم و پێکەوە ئەچین.. لە کوێیە تەرمەکە؟

نینا(( وەڕس و دڵگران)): نازانم دیار وتی لە خەستەخانەین.

ئاوا: جارێکیتریش مۆبایلم بەسەرا دانەخەیتەوە ئەوە پێموتی، ئەگینا هەموو گیانت ئەشکێنم.

نینا(( عاجزیی)): بەڵێ باش.

Cut

دیمەنی – ١٤٠٢ – ڕ/ن – قاوەخانە:

(( شەنیاو سامالّ ))

سامالّ: باشە، من ئەتوانم بە دزیی دایک و باوکمەوە بتهێنم و لە ئێستادا ئەوان پێی نەزانن، تا بزانین ئەگەینە کوێ؟

شەنیا: بیرۆکەیەکی زۆر باشە.. منیش کەسێکی ئەوتۆم نییە ئاگاداری بکەمەوەو هەر کاتی خۆی باوکم کە دایکمی هێناوە لە خزمانی دابڕاوە.. ئەتوانم بڵێم کەسم نییە.

سامالّ: ئەی تۆ نیوەڕۆ لای مامت نەبووی؟

شەنیا: مامی چی؟ پیاوێکی پیرە وەک مامم وایە، کاتی خۆی دراوسێمان بوو، ئێستا جاروبار سەرێکی ئەدەم و هەر پێی ئەڵێم مامە.. ڕۆژێک پێکەوە ئەچین بۆ لای.. (( دەمی ئەهێنیتەوە یەک )) وەیش توخوا زۆر جوانە سامالّ، یەک نورانییە هەر مەپرسە.

سامالّ: کەواتە چۆن دەست پێبکەین؟

شەنیا: تۆ ئەو برادەرانەت بهێنەو منیش هەندێ هاوڕێی خۆم و برایەوە.

سامالّ: کەی؟

شەنیا: ئێستا ! .. شەو!.. بەیانی.. هەر کاتێ مەبەستمان بوو.

سامالّ: من بەمجۆرە هەر زۆر زۆرم مەبەستە.

شەنیا: کەواتە تۆ کات دابنێ.

سامالّ: قوربانی تۆ بم زۆر سوپاس.. بە دەست من بێ شەو هەموو شتێک تەواو بێ.

شەنیا: نا.. بەیانیش دادگای ئەوێ هاهاها.

Cut

دیمەنی – ١٤٠٣ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٣٩٩ – ئۆفیسی وەکالەت – ڕ / ن :

(( خدرو تریفەو نارەوەن ))

نارەوەن: ئادەی توخوا مەرجەکان!

خدر: پەیوەندیم بە ژیانی کەسەوە نەبێ و ئامۆژگاریی ئاوا نەکەم بۆ هیچ شتێک و سێیەمیش (( تەماشای نامەکە ئەکا )) ئا.. دەست لە شەراکەتەکەت هەڵگرە لەو وەکالەتی وشکەیە.

تریفە: هەمووی پەیوەندیی بە ماڵی ئێمەوە هەیە.

خدر: ڕوون نییە.. بەڵام لە یەکەمیان هیچ تێناگەم لەبەرئەوەی قەت پەیوەندییم بە ژیانی کەسێکەوە نەبووە.

نارەوەن: لەبەرئەوەی دووەم باسی ئاوایە، یەکەمیش باسی نینایە.. کەواتە ئەو کوڕەم لە نیشانەی خەڵکێکایە.. ئاخر توخوا ئاوا چی کردووە دایکی بمرێ؟

تریفە: هەرسێ مەرجەکەی دوورخستنەوەتە لە ماڵی ئێمە، هیچیتر نییە.. من ئەڵێم کەسانێک لە بۆسەدان بۆ ماڵی ئێمەو تۆ ڕێگریانیت.. ئەی چی بکەین؟ بچینە دەرەوەو ئەم وڵاتەیان بۆ چۆڵکەین.

خدر: ئاخر بۆیە پێت ئەڵێم کە من و دایکت دانیشتین تۆ بچۆ بۆلای هەندرێن.. بەساقە تۆ سەری دنیات لێدێتەوە یەک و ئەترسیت.. دەرەوەی چی؟ ئەبێ بیاندۆزینەوەو بیاندەینە دەستی پۆلیسەوە.. تۆ پەیوەندیت بەم باسانەوە نەبێت، ئەوەی ئاواش.. من و دایکت چارەسەری ئەکەین، دڵ لە دڵ نەدەی باشە بەقوربان؟

تریفە: باش.

خدر: دە هەستە تۆ بچۆ بۆلای هەندرێن چاوەکەم، تا دێیتەوە چارەسەریشمان کردووە.

تریفە: باش، بەس توخوا ئەگەر شتی خراپ ئەبێ پێم بڵێن.

خدر: بەسەری خۆم ناهێڵم هیچی خراپ ببێ، تۆ بڕۆ با سەرمان لێ نەشێوێ.

تریفە: دە باشە.. (( ئەڕواتە دەرەوە))

خدر: ئەو هەتیوە بێ ئەقڵە لەم کاتەیا هێنای و تریفەی تێگەیاند.. ئەوە کۆڵی نەئەدا نەیزانیایە.

نارەوەن: ئەڵێم.. تۆ بڵێی هیچ دەستی دیدەوانی تیا نەبێ؟

خدر: بۆی ناچم.. جارێ هیچ مەڵێ و بیربکەرەوە لەگەڵما، بوەستە با مەرجەکان پێکەوە ببەستینەوە، شتێک هەر دەست ئەکەوێ.. تۆ بڵێی ئەوەندە ناحاڵیی بین؟

ـــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــ Cut ـــــــــ

دیمەنی – ١٤٠٤ – ڕ/ د – پارک:

(( ڕێبوارو تافان))

ڕێبوار: هەه بەڵێ بەڵێ.. نامەیەکیان بۆ ناردووەو یەکەمین مەرجەکە داخستنی ئەو بینینەی تۆیە لە شوقەکەی منا.. ئەوە یەعنی کاک دیدەوان تۆی هەر زۆر زۆر بەدڵە، بۆیە هەر کە ئەویمان جێهێشتووە، کەوتۆتە خەمی تۆوە.. چەتیو بیرت لێ ئەکاتەوە.

تافان: توخوا بە ڕاستتە؟

ڕێبوار: ئەی ئەوە نییە بەڵگەکەم پێوتی؟

تافان: خۆ ناوی منیان نەهێناوە بۆم قوت بێتەوە.

ڕێبوار: نا بۆیان خوێندمەوە، ناوی تیا نییە، ئەڵێ پەیوەندیت بە ژیانی کەسەوە نەبێ.. ئیتر ئەو لە ترسی بڵاونەکردنەوەی وێنەکان ئەتۆقێ و نەک تۆ، هەر پەیوەندیی بە هیچ کەسێکیترەوە نامێنێ.

تافان: ئاگات لێبوو لەوێش چۆن قوت بۆوە، جا ئەڵێ مار حەزی بەسیر نەئەکرد، لەبەر کونەکەیا ئەڕوا.

ڕێبوار: جا ئەوە چییە؟ کۆمپانیایەو ئیش ئەکەی، وەک چۆن پێشتر لای نا ئاوا بووی، ئێستا لای کاک دیدەوان.

تافان: تۆ پێم بڵێ.. من بەیانی کە هاتمەوە، پارە وەرئەگرم؟

ڕێبوار: جا کە پێویستیت بە پارەیە بۆ قسەت نەکردووە؟ چەندت ئەوێ بۆت بێنم؟

تافان: نا پێویستیم پێی نییە، بەس هەقی ئیشەکە ئەڵێم.

ڕێبوار: هەر بەیانیی بە سەلامەتیی بگەڕێنەوە، وا ئەکەم ئەوەندەت بدەنێ نەتوانی لەماڵەوە بیشاریتەوەو بیهێنی بۆ لای خۆم.

Cut

دیمەنی – ١٤٠٥ – ڕ/ د – بەر بوژاندنەوەی دڵ:

(( گێلاس و نیناو سۆماو دیار شیوەن ئەکەن و ئەگرین.. ئامۆو ئاوا لە لایەکەوە وەستاون))

ئامۆ: بە دایکم و ئەوانیشت بووتایە، با هەندێ پیاویش بهاتنایە، ئێستا من و تۆ چی لێ بکەین.

ئاوا: من کەوتووم بەسەر کۆستی خۆما ئامۆ گیان، وەڵاهی تاقەتی کەسم نییە، لەبەر عەیبەش نەبووایە ئێستا جێم ئەهێشتن.

ئامۆ: کێشەت هەیە ئاوا گیان؟

ئاوا: شاڵڵا کێشە بووایە.. سەرم خراوەتە قەبری ئاژدادمەوە.

ئامۆ: ئەی بۆ بە منت نەوتووە چاوەکەم؟ یان هەر بە تەسکەرە براین.

ئاوا: کورە تۆ کوا ئەتپەرژێتە سەر کەس، ڕێک خەستەخانەکە بۆتە زیندانت، کێ ئەتبینێ تا شتت بۆ باسکا؟

ئامۆ: تۆ ڕاست ئەکەی ئاوا گیان.. دڵنیابە ئیتر وا نامێنم، ئاگام لە هەمووتان ئەبێ.

ئاوا: کورە خۆشت یەکێکیت ئەوێ ئاگای لێت بێ هەهە. ئاگای چیت لێمان ئەبێ؟

ئامۆ: نا، لەمەولا پشتم پێ ببەستن.. تۆ پێم بڵێ، کێشەکەت چییە؟

ئاوا: وەڵا بچۆ لە دادە نینا بپرسە کەتنی ناوەتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٤٠٦ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٠٣ –ئۆفیسی وەکالەت –ڕ /ن:

(( خدرو نارەوەن))

خدر(( بیرکردنەوەو لە پڕا ناوچەوانی خۆ توند گرتن و بە تعجبەوە))

خدر: ئۆو خوایە چەند شڵەژاوووووم؟؟

نارەوەن: ئەزانم، ناهەقت نییە، منیش وام، سەرم یەشێ لە تاوا.

خدر: کچێ ئەوە ناڵێم، هەر زۆریش ئاسان بوو بۆی ئەگەڕام.

نارەوەن: دۆزیتەوە؟

خدر: کچێ هەر زۆر بە ئاسانیی، زۆر نزیکی خۆمانە!

نارەوەن(( دڵخۆش)): کێیە؟

خدر: ژنەکەی هەندرێنە، بەڵام ئەبێ بزانم کێ بۆی کردووە؟

نارەوەن(( تعجب)): ژنی هەندرێێێێن؟ (( زەنگی تەلەفونی بۆ دێت))

خدر: تۆ جارێ وەڵام بدەرەوە. تێت ئەگەیەنم.

نارەوەن: ئامۆیە، لەوێش شتێک ڕووی نەدابێ؟! هههه

Cut

دیمەنی – ١٤٠٧ – ش/ن – ماڵی شەنیا – هۆڵ:

(( ساماڵ و شەنیا بە جلوبەرگی بوک و زاواوە.. نیزامی باوکی شەنیا.. دلێرو سەرخێڵ و ڕێبین خزمەت ئەکەن.. دەوران و دڵنیاو زاهید.. مەراسیمی دوای مارە کردن و پیرۆزبایی کردن))

شەنیا: بە ڕاستی خۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو، بە تایبەت کە مۆڵەت بە باوکم درا ئامادەی ڕێ و ڕەسمی مارەبڕینم بێت، زۆر دڵخۆشم.. سوپاس بۆ ئێوەش.

(( پیرۆزبایی کردن و وەڵامی هاوشێوە))

نیزام: گەنجەکان گوێم لێ بگرن.. پەشیمانییەک لە ناخمایە، ئەگەر گەڕانەوە بۆ گەنجێتیی و لەدایکبوونەوە بلوایە، دڵنیابن هەموو ئەو ڕێیەی ژیانی خۆم ئەگۆڕی کە وایکرد لە ئاهەنگی کچە تاقانەکەما، بە مۆڵەت ئامادەبم.. بەڵام تازە بەسەرچوو.. هیوادارم ئێوە دوای کاری خراپ نەکەون و کەس بەلاڕێتانا نەبا.. تازە ناگەڕێتەوە، پەندێک لە من وەرگرن.

ساماڵ: ئێوە هەر گەورەو ڕێنیشاندەری ئێمەن و لە هەر کوێ بن، هەر ئازیزو خۆشەویستن.

دڵنیا: ئیتر ژیانە مامە نیزام، جێی هەموو شتێکی تیا ئەبێتەوە، هەر گوێشی مەدەرێ، ئێمە کەس و کاری شەنیاین، خەمت نەبێ.

(( لە میوتیدا دیالۆگ))

Cut

دیمەنی – ١٤٠٨ – ش/ د – تەنیشتی خێمەی ژنان – پرسەی ئاكۆ:

(( خدر چاوەڕوانی نارەوەن ئەكات و پاش كەمێک نارەوەن دێت))

نارەوەن: ها باوكەكەم؟

خدر: من ئەڕۆم ئیشێكم هەیە.. هەندرێن بانگكەو ڕایسپێرە تا من ئەگەڕێمەوە، ئێرە جێ نەهێڵێ، نەک كەسێک شتێكی پێویست بێ.

نارەوەن: نەچیتە سەر ئەو ژنە حەمە خدر، لەدەستی دێت شتێكت بۆ دروست بكاو توشی بەزمێكیشت بكا، شتی وا نەكەی.

خدر: نا نارەخان، نەقیب ڕاهۆز داوای كردووم لە شوێنێک ببینم، ژنی چی؟ هەر لە خەیاڵیشما نەمابوو.

نارەوەن: دە باشە.. وامزانی بیر لە شتێكی وا ئەكەیتەوە؟ ئەوەشی بۆ باسكە.

خدر: ئەی چۆن؟ بە تەلەفون پێموت، ڕەنگە هەر بۆ ئەم مەسەلەیەش بێ.

نارەوەن: دە بڕۆ ئاگات لە خۆت بێ.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ١٤٠٩ – ش/ن – ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و گوڵزارو سەرچڵ))

دیدەوان: ئێوە هەست ناکەن شتێک لە پشتی ئەم پەلە کردنەوە هەبێ؟ بە تایبەت بەو هەتیوە کە خەڵکی زۆری لەبەردەستایەو مافیایە!

سەرچڵ: نەوەڵا شتی وەکو چی؟ شەنیا شێتەو هاتووە بەسەریا، هیچیتر نییە.

دیدەوان: شەنیا شێتە؟ هههههە! ڕۆڵە ئەقڵی سەدی وەکو تۆ لە سەد ساڵا بە ئەقڵی ڕۆژێکی ئەو ناگاتەوە.. سادە تەماشای شتەکان مەکە.

سەرچڵ: ئەی ئەبێ چی لە پشتەوە بێ؟

گوڵزار: من بزانم کاک دیدەوان مەبەستی لەوەیە پارەکەی گروپ شەنیا بزانێ لە کوێیەو شوو کردنەکەی بۆ پاسەوانیی خۆی و ئەو پارەیەبێ.

دیدەوان: تەنها هەستێکە.

سەرچڵ: شەنیا وا نییە، باوەڕ ناکەم قەت ناپاکییمان لەگەڵ بکا.

دیدەوان: دەی بە ڕای من شەنیا وا لە چاوی ڕاستی خۆی ئەکا، ناپاکیی لەگەڵ چاوی چەپیا بکا.. ڕاستە ئەو منی ڕزگار کرد، بەڵام مەرامی لە پشتەوە بوو.. ئەو هەموو فیشەکەی نای بە سەری ڕەمزییەوە ئاهەنگ بوو ڕۆڵە، نەک تۆڵەکردنەوە.

سەرچڵ: من وام نەناسیوە، ئەو دڵسۆزی هەموومانەو ڕەمزیش زیاد لە پێویست پێی لێ هەڵبڕیبوو، شایانی خراپتریش بوو.

گوڵزار: جا یاخوا دەرکەوێ ئەو شوێنەکە بزانێ.. وەڵاهی وەک چۆن دووانەکەم تەخت کرد، ئاوا ئەمیش ئەکەم بەساقەسەری یەک گوللە.

دیدەوان: نا نا بەو هیوایەی نەگاتە ئەوەو خۆی شوێنی پارەکەمان پێ بڵێت.

سەرچڵ: کەواتە تۆ زۆر دڵنیای ئەو ئەیزانێ.

دیدەوان: ڕۆڵە من و ڕەمزی پێکەوە بڕیارماندا ئەو بکەین بە ژمێریاری گروپ و شوێنی پارەکەش بەو بوترێ.. من ئەمزانی ڕەمزی بە منی نالێ، ئەو پیلانەم بۆ ئەوە دانا، کە کەسێکیتریش ئاگاداری شوێنەکە بێ، نەک ڕەمزی نیازی دەست بەسەرا گرتنی هەبێ.. چونکە ڕەمزی جێی متمانەم نەبوو، پیاوی دارەوان بوو.

گوڵزار: جا دڵنیای ڕەمزی فێڵی لێ نەکردوویت و شوێنەکەی پێوتووە؟

دیدەوان: منیش گومانی ئەوەم لێ ئەکرد، بۆیە وامکرد لەبەرچاوی خۆم تەلەفون بۆ شەنیا بکات و پێی وت:

**بۆ فلاشباک:**

Cut

دیمەنی – ١٤١٠ – ش/ن – ماڵی ڕەمزی:

(( ڕەمزی و دیدەوان))

دیدەوان: ڕوحەکەم بنەکۆی ئێمە ئەوەیە کە لای تۆیە.. شوێنی پارەکانت بە شەنیاکە وت؟

ڕەمزی: بەڵێ ئەیچۆن؟ هەر لەسەر قسەکەی تۆوە کە وتت وا خوانەخواست تۆ تیاچووی، یان گیرای چۆن بیبینەوە بە خاوەنی؟ من یەکسەر بردم و ژووری پارەکانم نیشاندا.. قسەکەت زۆر لە جێی خۆیا بوو.

دیدەوان: ئەگەر ئەویش دوو ڕۆژیتر حاشای لێ نەکاو بڵێ نازانم شتی وا نەبووە.

ڕەمزی: هەر بۆ ئەوەی نەتوانێ ئەو قسەیە بکا، ئەبێ پارەیەک بۆ ڕاماڵ بنێرین، تا بە ناوی هاوسەرگیرییەوە بیدات بە کچە بچکۆلەکەی کاک دارەوان، ئەوە ئەمانەتەو کاک دارەوان خۆی بۆی داناوە.. ئێستا تەلەفونی بۆ ئەکەم بچێ پارەکە لەو شوێنە دەربکات و بۆی ببات.

دیدەوان: ئەوە هەر زۆر باشە.

ڕەمزی(( تێل ئەکات و دەنگی ئەداتە دەرەوە)): ئەلو! باشی شەنیا گیان؟

شەنیا(( دەنگ)): زۆر سوپاس کاکە.

ڕەمزی: ئەو پارەیەی پێموتی ببە بۆ ڕاماڵ، خۆم ناتوانم بێمەوە، خۆت بچۆ لە شوێنەکە دەری بکەو بۆی بەرە.

شەنیا: بەسەرچاو کاکە، لێرەم و ئێستا دەری ئەکەم.(( تەلەفون تەواو))

دیدەوان(( هەڵئەسێ)): ئەی زیاتر دەرناکا؟

ڕەمزی: ببورە ئەگەر تۆ بڕۆی، خۆم کامێرای چاودێریم لەسەر ئەو شوێنە داناوەو چاودێریی ئەکەم.

دیدەوان: زۆر باشە، میش لەسەر ڕۆشتن بووم. ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٤١١ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٠٩ –ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

گوڵزار: واو یەعنی ئەوەنە زۆرە لە ژوورایە؟

دیدەوان: ئەگەر هۆڵ نەبێ، دڵنیابە ژووری زۆر گەورەیە. ئەو پارەیە ژیانی زیاتر لە دە کەسی لەسەر دانراوە، ڕەنجی ڕاوەڕووت و قاچاخی ٢٠ ساڵە.

گوڵزار: واووو.. جا چۆن دەستی لێ هەڵئەگرم؟

سەرچڵ: ئەی کە ئەوە ئەزانی بۆ پێی ناڵییت و با نەبێتە کێشەمان لەگەڵ خۆی و مێردی.

دیدەوان: نکوڵیی لێکرد.

سەرچڵ: کەواتە بکوژرێ؟

گوڵزار: ئەوسا پارەکەش تیا ئەچێ.

دیدەوان: نا کوشتن نا.. مۆڵەتی یەک دوو ڕۆژم بدەنێ، شەنیا چەند پیلانگێڕ بێ، ناتوانێ لە داوی من دەرچێ.. پێتان ئەڵێم چی ئەکەین و چۆن ئەگەینەوە بەو سەرمایە گەورەیە؟

Cut

دیمەنی – ١٤١٢ – ش / ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان تەماشای تیڤی و مناڵیش هەڵبەزو دابەز ئەکەن.. لە دەرگا ئەدرێت))

تافان: ئا بچن ئەو دەرگایەی لێ بکەنەوە، دیارە کلیلەکانی ون کردووە.. هەهە.

((کلێپەو باڵا ئەچن دەرگا ئەکەنەوەو خدر داوای دایکیان ئەکا))

باڵا: دایکە وەرە ئەو پیاوەی خزمتانە بانگی تۆ ئەکا.

تافان: پیاوی خزمی من کێییە؟ با بێتە ژوورەوە. (( ئەچێ بەرەو دەرگا)) فەرموو فەرموو کاک حەمەخدر گیان، فەرموو توخوا.

خدر: نا هەر لە دەرگاوە یەک دوو قسەت لەگەڵ ئەکەم و ئەڕۆم کاتم نییە.

تافان: دەی مناڵ ئێوە بچنە ژووری خۆتان لەوێ یاری بکەن (( مناڵان ئەڕۆن)) ئاخر توخوا وانابێ کاکە گیان.

خدر: گوێبگرە تافان، ئەوەی ئەیڵێم دوو قسەیەو دووبارەی ناکەمەوە.

تافان: فەرموو ئەمرکە.

خدر: کێت ڕاسپاردووە ئەو نامانە بکاتە سەرم؟.. هیچ حاشای لێ نەکەی، چونکە ئەوەی تا ئێستا پاراستوومە، یەکەم کەس بە هەندرێنی ئەڵێم و ئینجا بە هەرچی کەسێک تۆ بناسێ.

تافان: تۆ باسی چی ئەکەیت کاک حەمەخدر گیان؟ بەخوا نە کەسم ڕاسپاردووەو نە نامەشم ئاگا لێیە.

خدر: باشە، کە ناتەوێ بیڵێی، ئۆباڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت، گلەیی لە من مەکە، خواحافیز.

تافان: توخوا بوەستە کاک حەمەدر گیان، لێت ئەپاڕێمەوە بە هەندرێن نەڵێی.. توخوا، هەر بیکە بە خاتری ئەو مناڵانە.

خدر: من خاوەنی قسەی خۆمم تافان.. کە وتم بە کەس نالێم و پەیوەندیی بە منەوە نییە، دڵنیابە کەس لێی نەبیستووم تا ئێستاش.. کە ئەشڵێم بە هەندرێن ئەڵێم، کامێرا چاودێرییەکانی پێ نیشان ئەدەمەوە، نەک بڵێی ڕاست ناکا. (( ئەیەوێ بڕوا ))

تافان(( ترسی زۆر)): بە ڤیدیۆش لاتە هەش بەسەرم؟

خدر: هەرچیت پێ ئەڵێم گومانت لە قسەم نەبێ. (( ئەیەوێ بڕوا ))

تافان(( گرژ)): دە تۆ بوەستە ماڵم ئاوا کردی ئەڵێی پەلامارت ئەیەم!

خدر: قسەی بەسوودت هەیە ئەوەستم، نییە ئەڕۆم، من قسەی خۆم لەگەڵ کردی.

تافان: ئاخر دە تۆ وەرە ژوورەوە، با لەیەک تێبگەین.

خدر: ئەگەر پێم نالێی سەرم مەیەشێننەو فرتوفێڵ بەکار مەهێنە، چونکە هەر لە چاوتا هەموو شتێک ئەخوێنمەوە، ئەمجارەش هەنگاو بۆ ڕۆشتن هەڵبێنمەوە، مەحاڵە بگەڕێمەوە.

تافان(( هەراسان)): دە باشە دەباش، بوەستە.. من نازانم کێ نامەی کردۆتە سەرت، بەڵام ئەو نامەیەم بیستووە، بێ ئەوەی بزانم دەستی کێی تیایە.. باوەڕم پێ بکە لەوە زیاتر هیچ شتێکیتر نازانم.

خدر: کێ ئەو هەواڵەی پێوتی؟

Cut

دیمەنی – ١٤١٣ – ش/د – پرسەی ئاکۆ – خێمە:

(( لە لایەکی خێمەکەوە کە کەسی تیانییەو هەر چەند هەرزەکارێک شت کۆئەکەنەوە.. ئاواو ئامۆ وەستاون))

ئاوا: ئا پێموت لای پورت بە جارێ، وا زوو مەیەرەوە.

ئامۆ: دەستخۆش، ئەوە زۆر باشە.. هیچ نەبێ ئەم ماوەیە بەریەک نەکەون باشە، هەردووکتان بارگاوین بە غەزەب.. بە تایبەت ئەو ئاوا گیان، ئەو سێ غەدری لێکراوە.. هەم غەدری کابراو هەم غەدری تۆش، جگە لەوەی بلاویش بێتەوە، قسەوقسەلۆکی خەڵکی نەفس نزم وێرانی ئەکا.

ئاوا: چاوی دەرئەهات.

ئامۆ: نا ئاوا گیان، ئەی ئەگەر خۆی کوشت چی ئەڵێی؟ ئەزانی ئێستا بۆ ئەو چەند قورسە؟

ئاوا: زۆر حەز ئەکەم خۆی بکوژێ و شوورەییەک نەهێنێ بەسەرمانا.

ئامۆ: ئای، ئەی ئەوسا شوورەیی نابێ؟ خەڵک ئەڵێن کچە لە خۆشیا هار بوو وانا؟.. برا ئەوسا ئەوەی ئەوترێ نەنگییەکەی زۆر لەوی ئێستا زیاتر ئەبێ.. ئەوسا هەر یەک چیرۆک نابیستی، دەیانت بۆ دروست ئەکەن.

ئاوا: ئەی چی بکەم ئێستا؟ هەر لێیگەڕێم و هەموو شتێک قبوڵکەم؟

ئامۆ: براکەم تۆ بە قسەی من بکە.. هیچ نەبێ تۆ دڵنەوایی بکە مادام خۆت ئاگات لە هەموو شتێک بووە.. دڵنەواییەکەت و باش بوونی تۆ لەگەڵیا، زۆر بە ئاسانیی ئەو بیرۆکەی خۆکوشتنە ئەسڕێتەوە کە من زۆر لێی ئەترسم.

ئاوا: باوەڕکە ئامۆ ناتوانم، کە وێنەکان دێتەوە بەرچاوم هەر شێت ئەبم.

ئامۆ: نابێ وابیت، ڕکێفی خۆت بگرەو بزانە کە فێڵتان لێکراوە، با بەردەوام ئەوە بێتەوە پێش چاوت کە پیلانگێڕیی لە دژتان هەیە.

ئاوا: بەو هیوایەی بتوانم ئەوە بکەم، تۆ ڕاست ئەکەی، نابێ خۆی بکوژێ.

ئامۆ: ئەو دنیای لەبەر تۆ پێ جوانە ئاواگیان.. کە بزانێ تۆ پشتگیریی ئەکەیت و گوێی نادەیتێ، زۆر دڵنیابە ئەوەندە قورس ناکەوێ بۆ ئەو.. ئەو ئێستا ترسی تەڵاقدانی هەیەو بەوەش ڕوو بکاتە کوێ؟ وانییە؟

ئاوا: کەواتە زوو فریای بکەوم هیچ شتێ نەکا.

ئامۆ: هەر زۆر زوو، ئافەرین، ئەگەر نەهێڵی ڕۆژ ببێتەوەو شتێکت گۆڕیبێ لەو تێکچوونە، تۆ براوە ئەبی.

ئاوا: باشە دوایی بانگی ئەکەم و زۆر لە خۆم ئەکەم هێوری بکەمەوە.

ئامۆ: زۆر دەستخۆش، کەمێکیش قسەی بۆ بکەو بڵێ غەدر لە هەردووکمان کراوە.

ئاوا(( بزە)): خۆم ئەزانم بە چی چاک ئەبێ.. خەمت نەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٤١٤ – ش/ د – ناو سەیارەی حمە خدر:

Mute

(( خدر بە خێرایی زۆر لەسەر شەقامەکان دەرئەکەوێ، بەرەو شوقەکانی ماڵی خۆیان ئەچێتەوەو زۆر بە پەلە لەبەر دەرگا ئەوەستێت و ئەگەڕێتەوە، لە داشبڵی سەیارەکەی دەمانچە دەرئەهێنێ و ئەخاتە ژێر چاکەتەکەیەوە))

Cut

دیمەنی – ١٤١٥ – ش / د – بەر دەرگای شوقەی ڕێبوار:

(( خدر لە دەرگا ئەدات و هەر لەگەڵ ڕێبوار دەگا ئەکاتەوە، خدر بۆکسێک بە توندی ئاراستەی دەموچاوی ڕێبوار ئەکات و ڕێبوار بە پشتا ئەکەوێ لەناو شوقەکەی خۆیا.. خدر بە پەلە ئامبازی ئەبێت و دەمانچە دەرئەهێنێت و ئەیخاتە سەر سەری و دەرگای دەرەوە دائەخا ))

خدر: مۆبایلەکەت دەرکەو هەموو ئەو وێنانە بسڕەوە سەگی سەگباب، کەس نەما یاری لەگەڵ بکەی، من نەبێ؟

ڕێبوار: بەخوا ئاگام لە وێنە نییە کاک حەمەخدر، وێنەی چی؟

خدر: تافان هەموو شتێکی پێوتم حاشای لێ نەکەی، ئەگینا هەر یەک فیشەکت تیا خەسار ئەکەم.

ڕێبوار: بەخوا من نیم، ئەوە مۆبایلیشم تەماشایکە، بزانە یەک ڕەسمی تیایە؟

خدر(( پشتە ملی ئەگرێ)): هەستە، هەستە گەلەریی مۆبایلەکەتم بۆ بکەرەوە(( تووڕە )) هەستە دەی!

ڕێبوار: بەسەرچاو، هەر ئێستا.

(( گەلەرییەکە ئەکاتەوە و خدر دەمانچەکە ئەخاتە سەر سەری و سەیریان ئەکا ))

خدر: ئەوە وێنەی خۆت و تافانت بۆ گرتووە خوێڕی؟ ئەو ژنە دایکی دوو منداڵەو مێردی هەیە.

ڕێبوار: بەخوا هیچم نییە لەگەڵیا.. خراپ تێمەگە تکایە.

خدر: خراپی چی تێ نەگەم؟ دێت بۆ شوقەکەت و لە پارکا وێنە ئەگرن و ئەی چیتر ماوە تا باش تێبگەم؟.. دەی چاوی هەردووکتان دەرئەهات پەیوەندیتان بە منەوە نییە، پێم بڵێ ئەو وێنانە لای کێن؟ دڵنیابە پێم نەڵێی ئەتکوژم ڕێبوار.

ڕێبوار: باشە، باشە با هەناسەیەک بدەم، هەموو شتێکت پێ ئەڵێم.

خدر: ڕاستم پێ نەڵێی کەرپیاو.

ڕێبوار: بەسەرچاو (( پاش کەمێک)) کاک حەمە خدر، زۆر ناخۆشە بە هەڵە لەو وێنەیەی من و تافان بگەیت.. بە گۆڕی باوکم وەکو خوشک و برا واین.

خدر: وێنەکانم پێ بڵێ لە کوێن؟ هەرچییەکن جاربەجەهانەم، وێنەکانم پێ بڵێ لە کوێن؟

ڕێبوار: هەمووی پەیوەندیی بە یەکەوە هەیە.. من و تافان پێکەوە ئیش ئەکەین و لە پەیوەندیی ئیش زیاترمان لە نێوانا نییە، کاتێ تۆ بینیت هات بۆ لای من زۆر ترسا بە هەڵە تێ بگەی، منیش ترسام بڵاوی بکەیتەوە.. ئیتر بە سەروو خۆمم وت شتێکی وا ڕوویداوە.

خدر: ئەک ملت شکێ، تۆ خۆت چیت تا سەروو خۆت هەبێ؟ چ سەگبابێک لە سەروو خۆتەوەیە.

ڕێبوار: تازە ئێمە هەموو بەیەکەوە ئیش ئەکەین.. ئاساییە پێت بڵێم، کاک دیدەوانە.

خدر: دیدەوان؟؟؟؟؟ ئەی وێنەکان؟

ڕێبوار: ئەویش خۆی ئەو پیلانەی بۆ دروستکردن، تا دەمی تۆی پێ دابخاو هیچیتر.

خدر: وێنەکان لای ئەوە؟

ڕێبوار: بەڵێ بەو دوو مۆبایلەشەوە کە وێنەکانی پێ گیراوە.

خدر: بەیانی تا نیوەڕۆ لەم شوقانەشدا نامێنی.. باش بزانە یەک قسە ئەکەم و دووبارە کردنەوەم نییە.

ڕێبوار: بەسەرچاو.. لێرە نامێنم.

(( خدر تفێکی تێ ئەکات و شەقێکی تێ هەڵئەداو جنێو ئەدات و ئەڕواتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٤١٦ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە – ژووری نارەوەن:

(( ڕەوەزو دیدەوان، پێکەنینی زۆر))

ڕەوەز: باشە تۆ بە چیا زانیت ئەو غەمگینە زاوای ئەوە؟

دیدەوان(( هێور بوونەوە لە پێکەنین)): کاکە بە بێ ئەقڵیی خدرا هەهە، ئەوە ئەمشەویش هەڵیکوتاوەتە سەر تافان و ڕێبوارو لە ڕێبواریشی داوە.

ڕەوەز: ئێی سەیرە.. خۆ من وامئەزانی زۆر لاشەڕو بێوەیە؟!

دیدەوان(( قاقایەکیتر)): ناوەڵا زۆر بێ ئەقڵ و هەڵەشەیە.. (( هێور بوونەوە لە پێکەنین)) بەڵام ڕەوەز باش بزانە، من ئەو کەرێتییەیم پێ خۆشە، خەڵکی وەک خدر گروپەکە زۆر پێش ئەخا.. من ئەزانم ئەمڕۆ خۆی بۆ ناگیرێ و مەسەلەی ئەو وێنانە وای لێ ئەکا هەڵکوتێتە سەرم.

ڕەوەز: ئەی من چییم لێرە؟

دیدەوان: نا نا نەکەی تۆ بڕۆ با دەستتان لە یەخەی یەک گیر نەبێ، ئەوە خراپە زۆر زۆر.. من زاواکەیم لایە، وێنەکانیشم هەر لایە، هیچی پێ ناکرێ.

ڕەوەز: پێت نەوتم چۆن زانیت زاوایەتی؟

دیدەوان: ئەوە لە کامێراکانەوە ئەمبینی، ئەوە یەک دوو ڕۆژە ئەم کابرایە بە گسکێکەوە لەمسەری بیناکەوە بۆ ئەوسەری پاک ئەکاتەوە، پشوویەک ئەدات و دووارەی ئەکاتەوە، وەک ئەوەی بە کرێم گرتبێ.. بە هەردیم وت چاودێرییم بۆ بکات و ماڵەکەیم بۆ بدۆزێتەوە هەهەه هەر کە دوای من ئەڕواتەوە هەردی دوای ئەکەوێ و ئەبینێ خۆی ئەکا بە شوقەکەی خدرا.. ئیتر ئەم بەیانییە دووانم ناردو برديان.

ڕەوەز: لە کوێیە، بۆ نەچم تۆزێکیشی بکوتم؟ هەهە

دیدەوان: نا بە کەڵکی لێدان نایەت.. یەک زللەی لێ بدەین، هەموو شتێک ئەشێوێ.

Cut

دیمەنی – ١٤١٧ – ڕ / ن – نەخۆشخانەی زوبێر- ژووری نەخۆش:

(( بەدەم ئازارەوە دەوران و هەستیی و ئامۆو دوو کارمەندی پزیشکیی، نیگار ئەخەنە سەر عەرەبانەیەک و تیرۆژ شتەکان کۆ ئەکاتەوەو تریفە دێتە ژوورەوە ))

تریفە: ئەمبۆلانسەکە لەناو دەرگاکەدایە، با بڕۆین.

ئامۆ: دەستخۆش بەساقەوبم، دەی فەرموون.

(( دایالۆگەکانیتر سەربەستن ))

(( وەک تحذیرات لە ڕێگەوبان و ڕێبواران و ئاخ و ئۆفی نیگار))

Cut

دیمەنی – ١٤١٨ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری نەخۆش – زوبێر:

((لە دیمەنێکی هاوشانداو لە هەمان کاتدا لە ژوورەکەی زوبێردا، ڕێژوان و سەلواو بروسک و دوو کارمەندی تەندروستی زوبێر بخەنە سەر نەقالەیەک و بەرەو دەرەوەی ببەن.. بە هەمان شێوە دیالۆگ سەربەستە))

Cut

دیمەنی – ١٤١٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن))

خدر: ئەی کە پێم ئەوتی وەرەوە ناو ئیشەکە تۆ گاڵتەت پێ ئەهات، دوای قسەی شەنیا کەوتبووی.. ئەم دیدەوانە بابزانی لە هەموو ئەوانی پێشووتر خوێنرێژترو مەترسیدارترە.. ئەمشەو زۆرم بیر لێکردەوە، گەیشتمە ئەو باوەڕەی لەو وێنانە زۆر خراپتر لە دژی تۆ بەکاربێنێ.. ئەیەوێ بەوە من و تۆو کۆمپانیاکەی ئاواش بۆ ئیشی خۆی بەکاربێنێ، جگە لەوەی ئەو تافانە نەگبەتەش دەستەمۆکا.

نارەوەن: ئەی ئێستا کاتی بەکارهێنانی هێز نەبێ کەی کاتیەتی؟

خدر: هێزی چی نارە گیان؟ تازە وا خەریکە بەڵگەمان بۆ گەلاڵە ببێ، هیچێکی ئەوتۆمان لا نییە بەقەدەر تاوانەکانیان بەهێز بێ.. بەڵام هەست ئەکەم ئیتر وەزری جموجوڵیانەو چواردەوریشم تەنیون، ڕەنگە زوو تێبکەون.

نارەوەن: ئەی ئێستا چ شتێک باشە بکرێ؟ من بچم و بڵێم گەڕاومەتەوە؟

خدر: ئەوە مەترسیی وێنەکان دووقات زیاد ئەکا.. ئێستا من ئەبێ بچمە سەری و هەندێ هەڵەشەیی بنوێنم.

# (( ئەڵقەی شەست و هەشت))

نارەوەن: نا بەساقە چۆن شتی وا ئەکەی؟ بەخوا دەسی تێ ئەچێ بتکوژێ، هیچ مەناعەتی نییە.

خدر: نا مەترسە، ئەو ئەوەی ناوێ.. ئیشی بە منەو تۆش بارمتەکەی.. ئەو داوای گەڕانەوەی تۆ ئەکا و منیش بە تۆو بە قبوڵکردنی ئیشەکەی، دانوسانی لەگەڵ ئەکەم.. بەوەش دیدەوان هەموو بەڵگەی تاوانەکانی ئەخاتە بەردەستمان.

نارەوەن: باشتر نییە تریفە نەیەتەوە ئێرە؟ با تێکەڵی ئەم ژاوەژاوە نەبێت و مەترسیی نەیەتە سەر.

خدر: نە نە نە.. هاتنی باشترە.. وەک گوێت لێبوو تیرۆژیش ئەچێتە سەر ئیش، کەواتە بە تەنیا ئەبێ لە ماڵا.. ئەوە هەر زۆر خراپە، هیچ نەبێ لێرە خۆشم لای نەبم، پارێزراوە. ئەو کوڕانەی لێن.

نارەوەن: ئاخر بۆیە واموت، من و تۆ ئەچینەوە ئەولا.

خدر: خەمت نەبێ، هاتوچوونیشی دابین ئەکەم، تۆش سەیارە دەرمەکە، چارەسەرێکت ئەکەم.. ئیتر هەموو شتەکان بەرەو گرژیی زیاتر ئەچێ.. من ئێستا ئەچمە سەر دیدەوان، ئەو چاوەڕێمە ئەزانم.. ئەگەر زوو ئەوە نەکەم، ئەم کەسێتییە تازەیەمی لا جێگیر نابێ.

نارەوەن: دەبڕۆ کوڕم، ئاگاداری خۆت بە نەهێڵی بگاتە تەقینەوە.

خدر: خەمت نەبێ.

(( چوونە دەرەوەی خدر))

Cut

دیمەنی – ١٤٢٠ – ڕ / د – ڕێگای دەرەوە:

(( تافان و گوڵزارو دڵنیا سەلام ناوێکی گەنج، بە هێلەک و پانتۆڵ و تیشێرتەوە.. لەناو مینی پاسێکی بچوکدا، سەلام لای سایەقەکەوە دانیشتووەو ئەمان لە دواوە ))

دڵنیا: هەر کە هاتیە نزیکی پاسەکە ناسیمیتەوە.

گوڵزار: ئاخر من لەوێش باش تۆم نەبینی هاهاها خەریکی لێدانی کابرا بووم هەهە ئەزانی داماوە مرد؟

دڵنیا: وەیش توخوا، هەهە بەخوا زۆر گوناحیش بوو هەهەهە.. ئەوە ئیشی چی بوو؟

گوڵزار: کچێ باسیان کرد حەماڵ بووە، ئیتر بە ڕەوەزی هاوڕێمی وتووە، چیت ئەوێ بۆت ئەکەم، بەس دوکانێکم بۆ دانێ، با بە چاکەت و پانتۆڵەوە ئیشی لەسەر بکەم.

دڵنیا: دیارە نانی شوانی خواردبوو داماوە؟ هەهەهە.

گوڵزار: نا نا لە ڕقی برادەرێکی خۆی، داوای ئەوەی کردبوو.. ئەویش هەر حەماڵ بووەو ئێستا چاکەت و پانتۆڵی لەبەرە، نازانم ناوی ستارە، فەلاحە، ئا ئا خدر، ناوی خدرە.

تافان: هەردووکیان لای مێردەکەم حەماڵ بوون.

دڵنیا: جا توخوا بە دەردی خۆیانەوە دانیشتنایە باشتر نەبوو؟ هەر حەماڵییەکەیان باشتر نەبوو؟ ئەوەتا خۆشی بە تڕان داو مرد.

تافان: ئەی وایە، ئیتر بەشی خوایەو ئەبێ شوکور بین بە بەشی.

گوڵزار: جا شێت و هاری من ببوو، هەهەهەهە!

تافان: تۆ!!!!!!!!!!

گوڵزار: ئای ئەوەنە بێ زەوق بوو، حەزی لە من بوو، ئەوسا تۆ دیار نەبووی بیبینیتایە.

تافان: تۆ ئەردەلان ئەڵێی؟

گوڵزار: کەپڵەکەم ئەڵێی؟ .. ئا.. ناوی ئەردەڵان بوو.

تافان: ئینجا من چۆن بێژم دێ هەر ئاوڕیش لە شتی وا بدەمەوە؟

گوڵزار(( ڕابواردن)): کچێ نەما نە.. ئەویش لەدەست چوو هههههه.

(( تافان پەست ئەبێ))

Cut

دیمەنی – ١٤٢١ – ڕ/ د – بەردەرگای ماڵی گێلاس:

(( نیناو ئاوا کەمێک لەولای دەرگاوە وەستاون))

نینا(( دڵخۆش)): نا هیچ عاجز نیم، نەوەڵا.. ئەوەی تۆ کردت زۆر پیاوانە بوو، بە پێناسە ڕۆژهەڵاتییەکەی ئەڵێم کورە، لەخۆت بایی نەبی (( بزە))

ئاوا: کچێ تەعزێیە تەعزێ، ئەو پێکەنینەت لەچییە؟

نینا: زۆر دڵخۆشم بەوەی مێردەکەم ئەقڵێکی گەورەی هەیەو لە شتەکان تێ ئەگا.. سوپاس بۆ داوای لێبوردنەکەشت، من داوای لێبوردن ئەکەم ئاوا گیان.. ئەزانی چی؟ باش بوو ئەم شتە ئێستا ڕوویدا تۆ بڵێ بۆ؟

ئاوا: باش بوو؟

نینا: ئا باش بوو، ئەگینا ئێستا شین و باوکەڕۆم بۆ کاک ئاکۆ دامەزراندبوو.. خوا عافویکا، بەڵام پیاوەتیت تەواو ئەوی بیر بردوومەتەوە.

ئاوا: دە باشە هیچت ناوێ؟ بچۆ ژوورەوە بەڵام وا دڵخۆش دەرنەکەوی کچێ، عەیبە.

نینا(( بزە)): نا نا خەمت نەبێ، حەز ئەکەی تەشتێ قوڕیش ئەدەم بەسەرما.. مادام کێشەکانم چارەسەر بوون، خۆم ئەزانم چۆن تەعزێ بەڕێ ئەکەم.

ئاوا: ئەزانم تا نەڕۆم ئەو بزەو خەندەیەت بۆ ناشاررێتەوە.. هەرچیتان پێویست بوو تێلم بۆ بکە.. بای. (( ئەڕوا))

نینا: قوربانت بم خوات لەگەڵ هەموو کەسی من.

(( نینا ئەچێتەوە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٤٢٢ – ڕ / ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو ساماڵ ماندوێتیان پێوە دیارە، دێنە ژوورەوە.. شەنیا لەسەر قەنەفەیەک خۆی ئەدا بە ئەرزا ))

شەنیا: هەر مردین مردین.. مارەبڕین ئەو هەمووەی بۆچییە؟

ساماڵ: دەی ئەوەشی ئەوێ بۆ ئەوەی قەت بیرمان نەچێتەوە، بەیانی تەواو ئەبێ، پشووت درێژ بێ.

شەنیا: جا ئیشەڵڵا بەیانیش تەواو نەبێ؟! هههە.

ساماڵ: ئەوە قەینا، بەڵام بەخوا کابرای لای گەراجەکەوە زۆر چاوبز بوو.

شەنیا: ئا ئا، ئەرێ ئەوە چیت بوو خۆ خەریک بوو پەلاماری بەیت؟

ساماڵ: ئەی نابینێ کابرایەکی زل و مل ئەستورت لەگەڵایە، کەچی چاوی بڕیوەتە ناو چاوت.. ئەوەم پێ قبوڵ ناکرێ.

شەنیا: جا خۆ بازاڕێکم لەگەڵ بکەی، پەنجا شەڕ ئەکەی! هەهە.

ساماڵ: ئەی ئەو هەموو قاوەخانەیە ئەچین بۆ هیچ ڕوونادا؟ بەس ئەو کابرایە هەر خۆی هیچ بوو.

شەنیا: گوێ مەدەرە ئەو شتانە ساماڵ گیان، دڵنیابە هەر هی خۆتم، هەزاری وا با بۆ خۆی هەر سەیر بکا، نافرم مەترسە هەهە.

ساماڵ: ئاخر منیش ئاوا پۆرتیان ئەشکێنم.

Cut

دیمەنی – ١٤٢٣ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە:

(( دیدەوان هێمن  و خدر هەڵەشەو تووڕە ))

خدر: تۆ بە چ حەقێک سیخوڕیی بەسەر من و کچی نارەوەنەوە ئەکەی؟

دیدەوان(( زۆر هێمن )): ئا.. بەو حەقەی تۆ زاواکەت کردووە بە سیخوڕ بەسەر کۆمپانیاکەمەوە.

خدر: درۆ ئەکەی شتی وا نەبووە.

دیدەوان(( وێنەیەکی غەمگین بە دەست و چاو بەستراویی لە ژوورەکەی کە تیا زیندانیی بوو، نیشانی خدر ئەدا )): ببینە زاوا سیخوڕەکەت چۆن باڵبەست کراوە، تۆش ئەتتوانی ئاوا سیخوڕەکەم باڵبەستکەی.

خدر(( تەماشای ئەکا )): دیدەوان ئەو کوڕە هەر ئێستا ئازادکە، تا زۆر گەورەتر نەبێتەوە.. باوەڕ بکە تا پێنج دەقەیتر ئازاد نەبێت، لێرە ناڕۆم.. ئەتکوژم.. دڵنیاش بە بەڵێنێک نادەم کە نەیکەم.

دیدەوان: من و تۆ لە ئاستێکا نەماوین کاک حەمەخدر، لە هەڕەشەو گوڕەشە بترسین.. ناشمەوێ هەراسانت بکەم.. ئەو گرتنەش تەنها بۆ ئەوەم بوو بزانیت ئاگاداری هەموو جوڵەیەکت هەم.. تەلەفونێکە، ئێستا ئەیکەم و دوای ئەوە ئەتوانی قسەی لەگەڵ بکەی.. خۆم هەر نیازی ئازاد کردنیم هەبوو.

خدر: ئەو دوو مۆبایلەشم هەر ئێستا بدەرێ، کە وێنەی ئەو ژنەت پێگرتبوو.

دیدەوان: ئەها، چاوت لێیە چۆن لە دەمارم داوی خدر؟ مەرج نییە ئەگەر شتێکم لە تۆ بوێ بێم ڕاستەوخۆ یەخەت بگرم، ڕێگەیتر زۆرە بەساقە.. ئەو ژنە لەبەر ئەوەی ئەبێتە براژنت، تۆی هەراسان کردووە.. بەڵام منیش مەرجم هەیە (( کۆمەڵە وێنەکەی نینا لە چەکمەجەی دەرئەهێنێ و دوو مۆبایلیش )) بۆ ئەوەی هەموو ئەمانە وەربگریتەوەو ئەو بابەتە بسڕینەوە.

خدر: مەرجەکەت تافان بوو؟ بەڵام لەبەر ئەوەی خۆتان زۆر بچووکن، لەو بڕوایەدابوون منیش ئەو قسەیە بگەیەنمە خەڵک.

دیدەوان: باوەڕم نەئەکرد ئەوەندە نەزان بی کاک حەمە خدر.. هههه مەرجی من کەی تافان بووە؟ یاڵڵای ئەکرد ئێستا ئەچووی بە مێردەکەیت ئەوت.. من مەبەستم نارەوەن بوو لە خاڵی یەکەما.. دوای ئەوەی تێگەیشتین تۆو کچەکەی پەیوەندیتان هەیە، ئەوسا بۆت نییە خۆت لە بابەتی نارەوەنا هەڵقورتێنی.

خدر: ئەگەر قسەکەی ئێوەش بێ و ببێ بە خەسووم وەک ئەڵێن، کە شتی وا نییەو ئێوە هەر نازانن بۆچی دائەنیشین پێکەوە.. ئەگەر وا بێت یان واش نە بێت، باش بزانە نارەوەن ماڵ و مناڵی هێڵی سوورن و کەس بۆی نییە لێیان نزیک بێتەوە.. ئەو منی دروستکردووە.. منیش بە گیانی خۆم پاداشتی ئەدەمەوە.

دیدەوان: زۆر باشە.. کەواتە تۆ سەنگەری خۆت گرتووە.. ئێمەش مەرجی خۆمان ئەڵێین و گەر جێبەجێ نەکرا، وێنەکانمان لایەو هەر شتێکیتریشمان لەدەست بێت، قسووریی ناکەین.

ـــــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٤٢٤ – ڕ/ د – ناو خێمەی تەعزێی ئاکۆ:

(( ئاوا لە تەعزێکە وەستاوەو مام لەتیف دانیشتووەو فاتیحا دائەدات و هەڵئەسێ و ئەڕوات، کە ئەگاتە بەردەمی ئاوا ))

لەتیف: کاک ئاوا زەحمەت نەبێ. (( پێکەوە ئەچنە دەرەوەی خێمەکە)) چووم بۆ لای کاک ڕزگاری مام فەریقی سەعاتچیی و قەدەرێکی باش پێکەوە بووین.

ئاوا: ئێ هەر زۆر باشە.

لەتیف: پرس و جۆی ئەو باسەم لەگەڵا دامەزراندو بە پێ بەرەو خوارووی ماڵەکەیان شۆڕبووینەوە.. نازانم ئەگەر بینیبێتت یان نا؟ لە سەر سیلەی کۆڵانی خوارەوە بە هەر بە دەستە چەپەوە، دوکانێکی بچکۆلەی لێیە.

ئاوا: نا، زۆر سەرنجم نەدا نازانم، ئێ.

لەتیف: کابرای دوکاندار بانگی ڕزگاری کردو تاوێ چووە لای و کە گەڕایەوە، وتی دوکاندارەکە ئەڵێ لەم ڕۆژانەی پێشووا کچێکی جوانکیلە هات سۆراخی ئەکردی، ناونیشانم داوەتێ، هاتووە یان نا؟ وتی ناوی مناڵەکانیشی پرسیوی پێموتووە.

ئاوا: ئێ ئێ؟ جا کێ نالێ ئەو کچە ئەم سیناریۆیەی دانەڕشتووە؟ لێت بپرسیایە هیچ کچێکی لەوجۆرە هاتووە بۆ ماڵتان؟

لەتیف: کورە هەر بردمیەوە بۆ ماڵەوەو چوو لە ماڵ و مناڵی پرسی و وتیان کەسی لەوجۆرە نەهاتووە.

ئاوا: هەڵبەت دوکاندارەکە شێوەی کچەکەی لەبەرچاوە بۆمان باس بکا.

لەتیف: ئەیچۆن؟

ئاوا: دە تۆ بڕۆ مام لەتیف، ئەرکت کێشا زۆر سوپاس، دوایی خۆم سەرێکی ئەدەم.

(( ڕۆشتنی هەردووکیان ))

Cut

دیمەنی – ١٤٢٥ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٢٣ – ڕ/ن /کۆمپانیای تازە:

خدر: دیدەوان! هەرچەند سەیرت ئەکەم تۆ لەسەر ئەو وێنانەو ئەو مەرجانەت بەدەستی من ئەکوژرێی.

دیدەوان: دانیشە هەرزەکاری ئەقڵ بەتاڵ، کوشتنی چی؟ گوێ لە مەرجەکان بگرە ئاسانە.

خدر: دانانیشم.

دیدەوان: من نهێنییەکی گەورەی ئەم ئیشەم داوەتە ئەو ژنەو داواشم لێکردی بۆ دڵنیایی با بگەڕێتەوەو بێتەوە ناو ئیشەکە، بە قسەت نەکردین.. ئێستاش ئەوە مەرجی یەکەمینمە.

خدر: دووەم؟

دیدەوان: تۆش وەک کوڕێکی ئازاو باش، لەگەڵ نارەوەندا دەست ئەکەن بەو ئیشەی بۆم دیاریکردوون.. بە تایبەت کە مافیایەکی گەورەی تێکەوتووەو ئێستا ئیشەکە ناوچەییە نەک هەر لێرە بێت.

خدر: سێیەم؟

دیدەوان: سێیەمیش ئەوەیە (( وەستان)) جەنابیشت هەر مەرجێکت هەیە بیڵێی.

خدر: باشە، هەموو وێنەکان و لە هەر شوێنێک هەیە بمدەنێ و من نارەوەن ئەهێنمەوە، بە زۆریش بێ قەناعەتی پێ ئەکەم.. با تەماشای سروشتی ئیشەکەش بکەم بڕیاری لێ ئەدەین.. من ئیشێک ناکەم دڵنیا نەبم لە سەرکەوتنی.. تەنها مەرجیشم ئەوەیە نایەیت بەلای کەسوکاری من و نارەوەنا، ئەگینا هیچی بۆ من تێناچێ، یەک فیشەک ئەنێم بە ناوی دەمتەوەو بۆ هەتا هەتایە بێ جوڵەو بێدەنگت ئەکەم.

دیدەوان: ئەمە قسەی پیاوە، بە دڵمە.. ئەی ڕێژەی چەندت ئەوێ لە ئیشەکە؟

خدر: تەلەفون بکە با غەمگینی زاوام بێتەوەو ئەو وێنانەو مۆبایلەکانیشم بدەرێ، دواتر باسی ڕێژە ئەکەین.

دیدەوان(( مۆبایلەکەی هەڵئەگرێت و تێل ئەکا)): ئەو کوڕە بەڕێزەوە ببەنەوە نزیکی شوقەکەی کاک حەمەخدرو مۆبایلەکەشی بدەنەوە..(( تێل تەواو)) ئەوەش مۆبایل و وێنەکان، لەسەر متمانەی تۆ ئەیدەەوە.. دڵنیاش بە هیچ وێنەیەکی لەبەر نەگیراوەتەوە، بە متمانەی ئیشەکەوە ئەوە لە من وەرگرە.

خدر: هەرچەندە باوەڕت پێ ناکەم، بەڵام لە هەر کونێکەوە دەربکەوێتەوە، ئەگەر دوای دەساڵیتریش بێ، هەر ئەمڕۆیە.

دیدەوان: بڕۆ بێخەم بە.

(( خدر شتەکان ئەبات و ئەچێتە دەرەوەو دواتر ڕەوەزو عارف ، کە پێشدەکەوێت دێنە ژوورەوە، شەرواڵ و کراس و بلوزێکی پیسی لەبەردایە))

دیدەوان: چیم پێوتی عارف؟

عارف: باشیان ئەناسیت هاهاها.

دیدەوان: من بەو وێنانە ئەمم دەستەمۆ کردو نارەوەنم هێنایەوەو تافان و ڕێبوارم ڕازیی کردو خۆم.. بیرۆکەی ئەم وێنانەش شەنیا بوو، بەوەش وام نیشانی شەنیادا کە ئەقڵێکی ئەوەندە گەورەیە، ئێمەو مانان بە شاگرد ڕاناگرێ.. کۆمپانیایەکەی ئاواشم ئیفلیج کرد، لەمەولا ئاوا لە خشەی مشکیش ئەسڵەمێتەوە.

ڕەوەز: ئەوە بەس نییە بۆ ئاوا.. ئەگەر پێشتر بەو وێنانەم ئەزانی، بیلاهی ئەمگەیاندە هەموو ماڵێکی ئەم وڵاتە، کوڕە بە عەمودەکانا هەڵمئەواسی.

دیدەوان: ئەوە هەرزەکارانەیە ڕەوەز، هەموو شتێکی لە دەست ئەداین.

ڕەوەز: کاک عارف مەگەر تۆ شتێکم بۆ بکەی بۆ ئاوا.. وا بێ تێکی بشکێنێ.. خۆی ئەمە دەرفەت بوو، لەمنیان شاردەوە.

عارف: جارێ شتی لە پێشتر هەیە.. یەک یەک کە ئیشمان پێیان نەما، بۆ تەنەکەی خۆڵەکە.

Cut

دیمەنی – ١٤٢٦ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( هەندرێن و تریفەو نارەوەن))

تریفە: وەڵا خۆ خراپیش نییە، ژن لە شوێنێک لای دایکمەو مێردەکەشی لە شوێنێکیتر.. هههه.

هەندرێن: ئێمە بچووکیتان ئەکەین تریفە خان.

نارەوەن: یەعنی تۆ بڵێ ئێستا لەوێیە؟

هەندرێن: نەوەڵا ئەمڕۆ لە کۆمپانیاوە ناردوویانن بۆ سەر مەرز، بارێکی گەورە هاتووە، کچەکانیتر دەرەقەت نەئەهاتن، لەبەرئەوەی ئەم پێشتر ئەو ئیشانەی کردووە، ئەمیشیان نارد.. هەر خۆی نەبوو، کە پاسەکە هات بە شوێنیا دوو کچی تریشم تیا بینی.

نارەوەن: دەی لەسەر خێر، وریای بە هەندرێن گیان، ژن داماوە بە دوو قسە هەڵئەخەڵەتێ و ڕۆژگارەکەش خراپە.

هەندرێن: وەڵا ئەگەر تا ئێستا من ئاگام لێی بووبێ، مادام تۆ ئەبی بە شەریک لەو کۆمپانیایە، ئیتر هەر زۆر بێخەمم.

نارەوەن: ناوەڵا قەت وا مەڵێ کوڕم، من ناتوانم بە باشیی ئاگاداری تریفەو تیرۆژیش بم.. هەموو لایەکمان پڕ مەشغەڵەتین.. خۆت هێمنانە جاروبار دڵنیا بەرەوە لە ئیش و هاتوچۆو ئەملاولا کردنی.

هەندرێن: بۆ خوانەخواست هیچت بیستووە نارەوەن خان؟

نارەوەن: جا شت ببیسم چۆن لێی قبوڵ ئەکەم؟ تۆش هەر کوڕی خۆمانی هەندرێن گیان.. بەڵام ئیتر ئاگا لێبوون وایە، منیش ئەوە لەگەڵ منداڵەکانی خۆم ئەکەم.

تریفە: وای لێهات دایکە؟ ئاگاشمان لە خۆمان نییەو چاودێریی ئەکرێین؟

Cut

دیمەنی – ١٤٢٧ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و سەرچڵ و شەنیا ))

دیدەوان: بە دڵنیاییی کەسێک لە ناومانا چێنراوە.. درەنگیش بە گەشتەکەی ئەو کچانەی زانیوە، ئەگەر زوو بیزانیایە ئێستا هەموویان گیرابوون.

شەنیا: نەوەڵا وەک ئەوەی ئێوە داتاننابوو بە ڕێگەی سەرەکیا بهاتنایەتەوە، ئاواش هەر گیرابوون.

دیدەوان: دەی سا خوا بمانکا بە قوربانی ئەقڵی تۆ، ئەگینا ئێستا کونە مشکیان لێ کردبووین بە پێنج ئەستێرە.. سوپاس، ئەوە جێی خۆی گرت، بەڵام لە ئێستاوە ئەبێ بۆ ئەو کەسە بگەڕێین، ئەگینا جوڵەمان پێ ناکرێ، ئاسایش دنیای تەنیبوو ئەمڕۆ.

سەرچڵ: ترست خستە بەرمان.

دیدەوان: ئەی چۆن؟ جێی مەترسییە.. لە خۆمان زیاتر کەس ئەم گەشتەی نەزانیوە.. چۆن گەیشتە دەمی ئاسایش؟

شەنیا: بەڵام ئەگەر هەواڵدەرەکە لە خۆمان بووایە، ڕێی گەڕانەوەشی ئەدا بە ئاسایش.

دیدەوان: ڕاستە.. ئەی تۆ پێت وایە کێ بێ؟

شەنیا: یەکێکە لە کەسوکاری ئەو سیانەو بە تایبەتیی تافان.. من بە دیاریکراویی گومانم بۆ مێردەکەشی ئەچێ.

دیدەوان: بۆ تافان و مێردی؟

شەنیا: لە سەردەمی پێشووا تافان چۆتە سەر سنورو ئەو ڕێشارەی کە ناردوونی، پۆدرەکەی پێ هێناوەتەوەو دواتریش لێکۆڵینەوەی زۆری لەگەڵ کراوە.. ئەمجارەش چۆتەوە بۆ سەر سنوور، چاوەڕوانی هەمان شتیان لێکردووە.. مێردەکەشی نەبێ کەس ئەمە نازانێ.

دیدەوان: واو.. چەند گرنگی بۆ ئێمە گوڵەکەم.. زۆر ڕێی تێ ئەچێ.. (( بۆ سەرچڵ)) ئەوە تۆ بۆ قسەیەک ناکەی؟

سەرچڵ: هیچم نییە بیڵێم، سەری لێدەرناکەم.

شەنیا(( بزە)): واز لە سەرچڵ بێنە.. ئەمڕۆ بە دوو کچ کردوویانە بە فلیم هاهاها. شەڕیان بووە لەسەر ئەم.. وەک زۆر جوان بێ.

سەرچڵ: جا هەمووی بەزمی تۆ.

دیدەوان: شتێک ڕوویداوە ئاگاداری نەبم؟

سەرچڵ: پەیوەندیی تەنها بە خۆمەوە هەیە، شتی گشتیی نییە.

شەنیا(( چاو لە دیدەوان دائەگرێ)): دوایی بۆت باس ئەکەم.

دیدەوان: دەی ئەوە کێشە نییە مادام شەخسییە.. ئەی هەوڵت نەدا بۆ دۆزینەوەی پارەکان گوڵی گیان؟

شەنیا: گومانم بۆ هیچ شوێنێک ناچێ، بیر لە هەموو قسەکانیشی ئەکەمەوە، ئاماژەیەکی تیا نییە.. خەریکە تێک ئەچم.

دیدەوان: من لە ئەقڵی تۆ ڕائەبینم و دڵنیام خۆت ئەیدۆزیتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٤٢٨ – ش/ن – ماڵی نیگار:

(( قەرەویڵەیەک زوبێری لەسەرەو قەرەویڵەیەکیتریش نیگار.. دەوران و تیرۆژو ئامۆو تریفەو باوکی خدرو غەمگین و هەرمێ و چیمەن و مناڵەکەی و سەلواو ڕێژوان و بروسک و تافان و هەندرێن و کلێپەو باڵا مناڵەکەی چیمەنی لە باوەشە لە دیمەنەکەدان))

هەندرێن (( بۆ زوبێر)): بەڵێ پێیان ئەچێ.. ڕێککەوتنێکیان هەیە بۆ دابینکردنی ئازوقەی ناوچەیەکیتر، خۆ دوایی ئەویش هەر ئەبێتەوە ئیش بۆ من.. هههە بەڵام بەخوا کاک حەمەخدرو نارەوەن خان شایانی ئەوەن پیاو خۆیان بۆ ماندووکا.

زوبێر: دەی ئیتر سەرچاوەی بژێویشتانە، هەر ئەبێ ماندوو بن، نان ئەمڕۆ لە دەمی شێرو گورگا نەماوە هەندرێن گیان، ئەوەتا لە کونی مارو ئەژدیهادایە، ئەبێ سەرکێشیی بکەی بۆ دۆزینەوەی.. باش نییە ئێوە بە ئاسانیی دەستتان کەوتووە؟

تافان: جا خۆ منیش ئیش ئەکەم، هەر ئەو نییە.

زوبێر: تۆ ڕاست ئەکەی تافان گیان.. ئیتر بە هەردووکتان ئەبێ فریا بکەون ئەو مناڵە جوانانەتان برسیی نەبن.

ئامۆ: کاک زوبێر گیان، من کچەکان بەرم پیاسەیەکیان پێ بکەم؟ دەمێکە بە هۆی ئەم وەزعانەوە دەرەوەیان نەبینیوە.

نیگار: ئەرەوەڵا خێریشت ئەگا ئامۆ گیان، ماڵت ئاوا بێ.

دەوران: یاڵڵاااااا دەی، بە دڵمە.

(( ئامۆ، تریفەو دەوران و سەلواو چیمەن و تیرۆژو هەرمێ بە زۆرو تافان بە زۆرو کە ئەڵێ ماندووی ڕێگەم ناتوانم لەگەڵ دوو مناڵەکەی هەڵئەسێنێ و ئەیانبا))

Cut

دیمەنی – ١٤٢٩ – ش/ د – بەردوکانێکی بچووک لە کۆلانێکدا:

**Mute**

(( ئاوا لە بەردەرگای دوکانێکا، لەگەڵ ڕزگاری مام فەریق و دوکاندارەکە وەستاون و بە ئامارە شێوەی شەنیایان بۆ باس ئەکا.. پاش ئەوە تەوقەی لەگەڵ ئەکەن و دواتر ڕزگارو ئاواش جیا ئەبنەوەو تەوقە.))

Cut

دیمەنی – ١٤٣٠ – ڕ /ن – کۆمپانیای تازە:

(( نارەوەن لە جێی خۆی دانیشتووەو خدرو دیدەوان و عارف لەسەر قەنەفەکان ))

نارەوەن(( جددی )): ئێمە بۆ ئیش لێرەین.. ئەوەی ئەوتریێ تەنها لە چوارچێوەی ئیشا ئەبێ، کێ قسەی تری هەیە لە شوێنیتر بیکا.. ئەمە یەک، دووەم لەم کۆمپانیایەدا تەنها کەسێک بڕیاردەر بێ، ئەوە منم، ڕازیم نییە هیچ کەسێک دەست لە ئیشم وەربدا.. دیدەوان تۆ ژمێریاریت لێرە، لە هەر شوێنێکیترو هەر شتێکیت، ئەوە پەیوەندیی بە ئیش و کاری من و کۆمپانیاوە نییە.

دیدەوان: نا نا نارەوەن خان، کۆمپانیا بە ناوی منەوە تۆمار کراوە، من ئەتوانم دەسەڵاتەکانت دیاری بکەم نەک خۆت.. تۆ بۆ ساڵێک لەگەڵ من ڕێککەوتووی.

نارەوەن(( هەڵئەسێ )): کەواتە من هیچ ئیشم لێرە نییە، ئیتر بۆ زۆرم لێ ئەکەن بگەڕێمەوە.

عارف: ببورە خوشک گیان، ئەتوانین لەسەر ئەوە ڕێکبکەوین.. تۆ فەرموو دانیشە.

نارەوەن: من جەنابت ناناسم و هەر ناشزانم چ کارەی لێرە.

دیدەوان: تۆ دانیشە نارەوەن خان سەغڵەت مەبە.. باشە با ئەم ساڵە وابێ.

نارەوەن: من دەسەڵاتی دەرکردن و وەرگرتنی هەموو کەسێکم هەیە لێرە، بە تۆشەوە.. ئەگەر ئاوا قبوڵتانە، ئەوە من کۆمپانیاکە بەڕێوە ئەبەم، بەوجۆرەی من ئەیخوازم.

خدر: ئەبێ وابێ.

دیدەوان: ئەسڵ نابێ وابێ.. بەڵام کە ئێوە زۆرداریی ئەکەن، ئێمەش ملکەچین.

نارەوەن: ئەمە ئیشەو ڕێککەوتن نەک زۆرداریی و خەڵک هەراسان کردن.

عارف: ببورە هەرچەندە من نایناسی، ئەوە کاک دیدەوان وەک ناوبژیوان منی بانگ کردووە، ئەتوانم قسەیەک بکەم، بۆ ئەوەی ڕەوانتر ئیشتان بڕوا؟

نارەوەن: نا کاکە، هەموو شتێ براپەوە، ڕاستیەکەی من بۆ ڕێککەوتن نەهاتم بەقەدەر ئەوەی بۆ سەپاندنی مەرجەکانم بوو.

دیدەوان: بەردەوام مەرجی تۆ ئەرکی جێبەجێ کردنی لەسەر ئێمەیە.. فەرمانتە جەنابی بەڕێوەبەر، پیرۆزت بێ. بەڵام ئەگەر پێت خۆش بێ کاک عارف بناسی، ئەو هاوڕێی منالّیی و بڕبڕەی پشتمە.. بۆیە نالّێم ئامۆزامە، لەبەرئەوەی بەقەدەر خۆم بە تەنگمەوە دێت، نەک ئامۆزا.

نارەوەن: خوا لە یەکتان نەکا، کارم بە کاک عارف نییەو من تەنها لەگەڵ کارمەندەکانی ئێرە مامەڵە ئەکەم.. ئا دیدەوان، هاوکاریش بانگ ئەکەمەوە هەرچی ئامێرو ئەو کەرەستەی سیخوڕییانەت هەیە بەسەر ژوورەکانیترەوە، هەمووی فڕێ ئەدەمە تەنەکەی خۆڵەکەوە.

دیدەوان: ئیشم پێیان نەماوە، بۆت هەیە.

خدر: دوای ئەوەی کاک عارف ئەڕوا، ئەتوانین ئیشەکانیتریش باس بکەین.

دیدەوان(( چاوی زەق ئەکاتەوە)): عارف ناڕوات، عارف دڵی ئەو ئیشەیە کە دەستی ئەدەینێ حەمەخدر.. تا ئێرەو بەس، لێرەوە گوێ لە عارف بگرن، ئیتر قسەمان لەسەر کۆمپانیاکە تەواو.

خدر: بەڵام من وامزانی هەر بۆ ئەوە هاتووە.. ببورە.

Cut

دیمەنی – ١٤٣١ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو دڵنیا ))

شەنیا: تۆ پیاو ناناسی دڵنیا گیان، بەوە نیە خۆت بە زیتەڵە ئەزانیت و یارییت بە دوو سێ داماویان کردووە.. من سەیرم لە دوورکەوتنەوەت هات، یەکسەر تیگەیشتم کەوتوویتە داوی یەکێکیانەوە، بەزەییم پیاتا ئەهاتەوە.

دڵنیا (( بێتاقەت )): ئەی من چی بکەم ئێستا؟ کەسوکاریشم تێگەیاندووە.

شەنیا: ئەمڕۆ تا نیوەڕۆکەی لەگەڵ ساماڵا خەریکی فەحسی خوێن و خانە گواستنەوەو ئەو شتانە ئەبین، دوای نیوەڕۆ وەرەوە بۆ ئێرە (( ساماڵ دێتە ژوورەوەو تعارف و سلاو )) دوای نیوەڕۆ یەک ئەبینین ماڵەکەم باشە؟

دڵنیا: دەی باشە، ئەتبینمەوە، بای.

(( ڕۆشتنی دڵنیاو خۆکۆکردنەوەی شەنیا بۆ ڕۆشتن ))

Cut

دیمەنی – ١٤٣٢ – ڕ / ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆ و ڕاهۆز بە پێوە ))

سەرکۆ: چاودێریی سەر تافان توندتر بکەنەوە.. هیچ دەرنەکەوت؟

ڕاهۆز: نەخێر گەورەم ژیانی ئاسایی بەڕێ ئەکا، شەوێ لە ماڵان بووە لەگەڵ مێردەکەی و بەیانیش چووە بۆ ئەو کۆمپانیا تازەیەی دەوامی تیا ئەکا.

سەرکۆ: کێشەی ئەوێمان نییە.. بەڵام خۆ ئەکرێ هەر چێکی ڕێگەوبانیشیان کردبێ.. یان ڕێیان گۆڕیبێ.

ڕاهۆز: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە، ڕێیان گۆڕیبوو، ئەگینا لەو هەموو مەفرەزانە چۆن دەرباز ئەبوون؟

سەرکۆ: ئەی هەواڵی حەمەخدر؟

ڕاهۆز: گەورەم زۆر نزیکن لە دەستپێکردن.. ئەمڕۆ عارف ناوێک دەرفەتی دوو ڕۆژی لێوەرگرتوون تا قسە لەگەڵ سەرچاوەکەیان بکا، تا بڕێک لەو پارەیەی کە پێویستە بیگەیەنن، بکرێ بە قەرز. کێشەی پارەیان هەیە، نارەوەنیش چۆن بەرنامەت بۆ دانابوو، پێم گەیاندو ئەویش ڕێک ئەوەی کردووە.

سەرکۆ: لەمەولا بەرنامەی نارەوەن بگۆڕەو پێی بڵێ کێرقی تورەبوون و گرژییەکەی دابگرێ و جۆرێک نەرمیی نیشان بدات، بۆ پڕکردنەوەی متمانەیان.

Cut

دیمەنی – ١٤٣٣ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە- ژووری تافان:

(( ڕێبوار دێتە ژوورەوە بۆ لای تافان، زەرفێک پارەی پێیە وەک دوو دەفتەر))

ڕێبوار(( زەرفەکە دائەنێ)): ئەمەت بەسە؟

تافان(( لە خۆشیا ئەگەشێتەوە)): واو ئەو هەمووە بۆ من؟ جا چی لێبکەم؟ ئەو هەموومە بۆچییە؟

ڕێبوار: ئەی چۆن؟ تۆ مەترسیت هێناوەتە سەر ژیانی خۆت، ئەبێ بەقەدەر ئەوەشت دەسکەوێ.

تافان(( هەڵوێستە)): بگیرامایە چی ڕووی ئەدا ڕێبوار.

ڕێبوار: یاخوا قەت نەگیرێی، گرتنماڵوێرانییە، هەموو شتێک تێک ئەدا.

تافان: یەعنی وەک کاک دارەوانم لێ ئەکەن؟

ڕێبوار: تۆ بۆ باسی ئەو شتانە ئەهێنیتە مێشکی خۆتەوە؟.. ئیش تەواو بووەو بڕۆ بە دەسکەوتەکەی ڕابوێرەو خۆت دڵخۆشکە.

تافان(( ڕووی گەش)): با ئەمە لای تۆ بێ (( دەفتەرێکیان ئەگێڕێتەوە)) بۆم هەڵگرە.. ئەویتریش شتێکی بۆ ئەدۆزمەوە.. توخوا با مناڵەکانیش بە دڵی خۆیان هەرچییەکیان ئەوێ بۆیان بکەم.

ڕێبوار: کچێ ئیش ئەوەندە زۆرە سەد مناڵیشت ببێ فریای تەواو کردنی ناکەون.

تافان: یەعنی جارێکیتریش ئەچینەوە؟

ڕێبوار: هەر جارێک؟! تۆ بڵێ سەد، هەزار!!!!

———— گەڕانەوەی هەیە ———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٤٣٤ – ڕ / د – دوکانی غازفرۆش:

(( عارف وەستاوەو منالێک لەسەر دوکانەکە دائەنێ کاتێ پشکۆ بە سەیارەی بەرزی گرانبەهاوە.. تەمەن نزیکەی ٤٠ ساڵ ، شیک.. دێت و دوو بوتڵ غازی پێیە بۆ پڕ کردنەوە.. عارف لەگەڵ پشکۆیا ئەکەونە قسەو منالەکە بوتڵەکانی لە سەیارەکەی بۆ دائەگرێت و بوتڵی پڕ ئەخاتە شوێنی))

پشکۆ: ڕازین، بەڵام ماوەکەی زۆر کەمکردەوە بۆ دوو حەفتە، ئەڵێ ئەگەر ناشیانەوێ کڕیاریتر هەن.

عارف: زۆر کەم نییە دوو حەفتە پشکۆ گیان؟

پشکۆ: کە ئەڵێ کڕیاریتر هەن، مانای وایە دەرگای داخست، دوا وەڵامم بدەرەوە با پێیان بڵێم.

عارف: ئەکرێ ئێوارەوە وەڵامت بدەمەوە؟

پشکۆ: نەوەڵا هەر ئێستا.

عارف: وا ناتوانم بڕیار بدەم. کاتم پێویستە.

پشکۆ: دە لێیگەڕێ تا پارەتان دێتە دەست.

عارف: ئەتوانی پێیان بڵێیتەوە مانگێکیتر؟ لەو بڕەش زیاتر بێ پارەی بۆ جۆر ئەکەین.

پشکۆ: نازانم، لە کاتی خۆیا قسەی تیا ئەکەینەوە.

عارف: کێشەکەم ئەوەیە ئێستا کڕیارەکەی منیش ئەو پارەیەی لە دوو حەفتەیا نایەتە دەست قەرزەکەی پێ بدەینەوە، ئەڵێ مانگم ئەوێ، ئەویش لەسەر کڕیاری خۆی ئەوەستێ.

پشکۆ (( بۆ منالێ)): غازەکانت بار کرد؟ (( بۆ عارف)) هەر لێیگەڕی کەواتە، ئەوان چاوەڕوانی کڕیاری تۆو ئەم و ئەو ناکەن، پارەی خۆیان ئەوێ.

Cut

دیمەنی – ١٤٣٥ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هەندرێن چایەکی لەبەردەستایە.. کارە لە جێی خۆی دانیشتووە، هاوڕێ سەرقاڵە))

<u>**هەندرێن مۆنۆلۆژی ناوەوە**</u>:

ئەی خۆ نارەوەن خان لە خۆیەوە قسە ناکا، پیاو ئەبێ ئەقڵی بێ، ئەگەر شتێکیشی بیستبێ بە من ناڵێ.. ئێ هەروایە، نایەوێ خۆی توشی کێشەکا ..بچم بۆلای لە هەمووی باشترە.. لەمەولا هەفتەی یەک دووجار بچم تاقیبێکی بکەم باشە.. خۆ ئەزانم لە ئاوی شەوێ پاکترە، بەڵام لەناو خەڵکیشا با بزانن مێردەکەی فەرامۆشی نەکردووە.. ئەی هەروا باشترە.

<u>**مۆنۆلۆژ تەواو**</u>:

هەندرێن (( چایەکە ئەخواتەوەو هەڵئەسێ بەرەو ئۆفیس)): دەستخۆش هاوڕێ گیان.

هاوڕێ: عافێتت بێ.

__________ تابع __________ Cut __________

دیمەنی – ١٤٣٦ – متبوع – ر/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە و پاش کەمێک هەندرێن دێتە ژوورەوە))

هەندرێن: تریفە خان مۆڵەتی سەعاتێکم ئەوێ، ئەگەر بتوانی خۆت ئاگات لێ بێ هەرکەسێ هات.. پێموتوون بێن بۆ لای تۆ.

تریفە: فەرموو کاک هەندرێن.. تۆ ئەوە یەکەمجارتە داوای مۆڵەت بکەی، چۆن دڵم دێ بڵێم نا؟ هههە.

هەندرێن: توشی دڵەڕاوکێیەکی سەیر بووم، قسەکانی دایکت هەر لە گوێما ئەزرنگێتەوە، وایە من تافانم زۆر فەرامۆش کردووە، هەر ئاگام لێی نەماوە چی ئەکاو نایکا.

تریفە: ئۆو کاک هەندرێن گیان، بە خوا باوەڕ ناکەم مەبەستی ئەوە بووبێ چاودێریی بکەی، ماشەڵڵا خۆی ژنێکی گەورەو ئاقڵە، ڕاست و چەپی خۆی باش ئەناسێ.

هەندرێن: ئەگەر واش بێ، مانای ئەوە نییە هەست بەوە بکا کەس لێی ناپرسێتەوە.

تریفە: ئەوەیان خۆت ئەیزانی، بەڵام لە تافان مەترسە وریایە. فەرموو، من ئاگام لێرە ئەبێ، خەمت نەبێ.

هەندرێن: زۆر سوپاس.

Cut

دیمەنی – ١٤٣٧- ڕ / ن – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٣٣ – کۆمپانیای تازە – ژووری تافان:

(( ڕێبوارو تافان، دوو دەفتەرەکەیان هەر لەبەردەستتدایە))

تافان: باشە کەواتە هەرچیم لێ زیاد بوو تۆ بۆم هەڵگرە، هەرکاتی پێویستم بوو بۆ شتێک بۆم بێنەوە.

ڕێبوار: تۆ هەر ئەمرت نەکردووە؟

تافان: زاڵم ئەمر نەکا، ئەی تۆ پێم بڵێ، ئەگەر هیچی بۆ خۆت تیا نەبووە، ئەوە نیوەی هەڵگرە.

ڕێبوار: خەمی منت نەبێ، لەسەر بەردی ڕەق پارە پەیا ئەکەم، منیش بەقەدەر تۆیان داومەتێ، زۆر سوپاس.

تافان: منیش ئەمە شتێکی بۆ ئەدۆزمەوەو خەرجی ئەکەین.

ڕێبوار: ئەی پارە هەر بۆ خەرج کردن نییە؟ وەڵا بە دڵی خۆت پێی بخۆو بخۆرەوە.

تافان: ئەیڕۆ خواردنەوەی چی؟

ڕێبوار(( بزە)): ساردی و شەربەت ئەڵێم.. هەهە مەترسە، ئەوە قسەی پیاوانە، پیاوان وا ئەڵێن.

———— گەڕانەوەی هەیە ———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٤٣٨ – ڕ/ د – خێمەی تەعزێی پیاوانی ئاکۆ:

(( نینا لە ماڵی گێلاس دێتە دەرەوەو مناڵێک بانگ ئەکا ))

نینا: بەساقەوبم بچکۆل گیان بچۆ لەو خێمەیە بڵێ کاک ئاوا کێیە بانگی ئەکەن.

مناڵ: کاک ئاوا؟

نینا: ئا ئا کاک ئاوا.

مناڵ: بەڵێ باشە.

(( پاش کەمێک ئاوا دێت ))

ئاوا: ها نینا ئیشت پێم بوو؟

نینا: بەساقەوبم ئاوا گیان ڕۆنمان لێ بڕاوە، خۆت بچۆ یا یەکێ بنێرە، لە دەورتگەڕێم.

ئاوا: باشە، خۆشم هەر حەزم ئەکرد کەمێ بجوڵێم.. خۆم ئەچم.

نینا: کوبانی زوو بێیتەوە.

ئاوا: ئۆ کەی؟.. !

نینا(( پێکەنین )): بەیانی بەیانی، تۆ زوو بڕۆ هەهە.

ئاوا: کچێ بەسە پێکەنین، ئاگات لێ بێ لە کوێی.

(( ئاوا ئەڕوات و نیناش ئەچێتە ژوورەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٤٣٩ – ڕ/ د – بەردەرگای کۆمپانیای تازە:

(( هەندریێن بە پێ بەرەو کۆمپانیا تازەکە دێت و هەندێک چاو ئەگێڕێ، لەو کاتەدا هەردی دێتە دەرەوە))

هەندرێن: ئەوە زەحمەت نەبێ برا.

هەردی: ئەوە کۆمپانیای کاک دیدەوان کامەیە؟

هەردی(( بە ئیهمالیی، ئاماژەی بۆ ئەکا)): ئەمەیە.

هەندرێن: باشە سوپاس.

(( بەرەو کۆمپانیاکە ئەچێ))

Cut

دیمەنی – ١٤٤٠ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٣٧ –کۆمپانیای تازە –ژووری تافان:

(( پارەکە هەر لەبەردەستتایە.. ڕێبوار هەڵئەسێ و ئەچێتە نزیکی تافانەوە ))

ڕێبوار: تا تۆ باشتر بی لەگەڵ منا، بە لێشاو بەسەرتا ئەبارێ.

تافان: تێناگەم.. لەوە باشتر چی؟

ڕێبوار: مەبەستم ئەوەیە هەرکاتێ بۆ ئیش داوام کردی، ئامادە بیت.. چونکە ئەم ئیشەی ئێمە ناکرێ تیایا دوابکەویت و هیچ بیانوویەکیش دادمان نادا.. ئیتر ئەبێ خۆت لە ماڵەوە جۆری بکەیت و وا بکەی هەرکات پێویستیمان پێت بوو، مێردەکەت ئاسایی وەریگرێ.

تافان: هەر بە شەو نەبێ، چونکە بە هیچ جۆرێک ناتوانم ئیزنی لێوەرگرم، ئەگینا بە ڕۆژ هەرکاتێ بتەوێ لەخزمەتتام.. تۆ ئەمر ئەکەی.

ڕێبوار: من یا پارەکانی بەردەستت؟ هههە.

Cut

دیمەنی – ١٤٤١ – ڕ / ن – ڕاڕەوی کۆمپانیای تازە:

(( هەندرێن دەنگی پێڵاوەکانی بە بەرزیی دێت و هاوکار ئەبینێ))

هەندرێن: بێزەحمەت تافان؟

هاوکار(( ئاماژەی ژوورەکەی ئەکا)): ئەوە ژوورەکەیەتی.

# (( ئەڵقەی شەست و نۆ))

(( هەندرێن بەرەو ژوورەکەی ئەچێت))

تابع ——————— Cut ———————

دیمەنی – ١٤٤٢ – متبوع – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٤٠ – کۆمپانیای تازە – ژووری

(( ڕێبوارو تافان زۆر نزیکن لە یەکەوە ))

ڕێبوار: بەزمی زۆریشی ...........

تافان: (( دەرگای ژوورەکە داخراوە.. تافان دەست ئەخاتە سەردەستی ڕێبوار بە مەبەستی ئەوەی بێدەنگ بێ..)) بێدەنگ! ئەوە دەنگی پێڵاوەکانی هەندرێنە ئەیناسمەوە، تەقەی دێت.. خێرا ئەو پارەیە لابە.

(( بە پەلە پەل هەردووکیان پارەکە لا ئەدەن و ڕێبوار هەڵئەسێتە سەرپێ و لێی دوور ئەکەوێتەوەو دەرگا ئەکرێتەوە ))

هەندرێن: ڕۆژتان باش.

(( وەڵامدانەوەو بەخێرهاتن و تەعاروف ))

هەندرێن: وتم با سەرێکی ژنە جوانەکەم بەم، نەڵێ لێم ناپرسێتەوە.

تافان: یاخوا بەخێر بێی، وەڵا باوکم بەرەو پێشچوون هەیە، دەستخۆش پێمخۆشە.. کاک ڕێبواریش بۆ بەخێر هاتنم هاتبوو.

ڕێبوار: دەی بە یارمەتی، هەر بۆ ئەوە هاتبووم تافان خان خۆشحاڵ بووین.

(( چوونە دەرەوەی ڕێبوارو خواحافیزیی.. تافان دڵخۆشییەکی زۆر نیشان ئەدا، هەندرێن پێی سەیر ئەبێ ))

هەندرێن: زۆر سوپاس، ئەوەندە هاتنەکەمت پێ خۆش بوو تافان گیان؟

تافان: کورە هەر هاتن؟ خوا دەرگای لێکردووینەتەوە هەندرێن ئاگات لە چییە؟

هەندرێن: ئادەی بزانم، با منیش دڵم خۆش بێ، من وامزانی بە هاتنەکەم شادمان بوویت.

تافان: هاتنەکەشت خۆش بوو سوپاس، ئەرکت کێشا.. بەس تۆ گوێ بگرە با بۆت باسکەم.

هەندرێن: یاڵڵا خێر؟

تافان: ئەم بەیانییە کە هاتم، وەک عادەتی خۆم بەردەوام سەر ئەژەنمە ئەرزەکە، تاقەتی تیروتوانجی و بینینی خەڵکم نییە.

هەندرێن: باش ئەکەی دەستخۆش.

تافان: ئینجا گوێ بگرە.. عەلاگەیەکی شینم بینی، بە جۆرێک هاتە بەرچاوم.. وتم وەڵا ئەمە یا خەڵکەو جێی دەست نەکەوتووەو پیسایی تێکردووە، یان شتێک هەیە.. ئیتر قێزم لێی هاتەوەو کەمێکیش تێپەڕیم.

هەندرێن: ئێ، سەیرەبێ گەڕابیتەوە سەری؟

تافان: ئەرەوەڵا گەڕامەوە سەری و بە هەزار قێزو بێزەوە دەستم دایە.. هەستمکرد شتێکی تیایە، ئیتر هەر بە نینۆکەکانم وردە وردە دڕاندم، تا گەیشتمە ناواخنەکەی.. تۆ بڵێ چی تیا بوو؟

هەندرێن: ئادەی بیڵێ.

تافان(( دەست ئەکا بە چەکمەجەی مێزەکەیاو دەفتەرە دۆلارەکە دەرئەهێنێ، هەندرێن چاوی زەق ئەکاتەوە)): ئەمە.

هەندرێن(( دەستی ئەداتێ و بە پەنجەیەکی ئەیاندا بەیەکا بۆ دڵنیابوون لەوەی هەموو دۆلارە)): تافان حەرامە! خوا ئەزانێ هی چ داماوێکە؟

تافان: داماو ئەمەی پێ نابێ هههه.

هەندرێن: کێ نالێ ساختەکراو نییە؟

Cut

دیمەنی – ١٤٤٣ – ڕ/ن – ژووری دڵنیا لەماڵەوە:

(( دڵنیاو ئارەزوو))

ئارەزوو: بەخوا لە ژێر دەمی کاکم دەرناچی با بزانی.

دڵنیا(( دڵتەنگ)): ئەی من چی بکەم چی؟ بەڕاستی تەنها شەنیا شک ئەبەم بتوانێ بیدۆزێتەوەو شتێکم بۆ بکا.

ئارەزوو: تازە شەنیاو باوکی شەنیاش ئەتوانن چیت بۆ بکەن؟ کە ئەو یاری تری هەبێ و تۆ بە خزم بداتە قەڵەم لەبەرچاوی کەپڵەکەیتریا، ئەوە شەلاتی و مەلاتییە قەت خێری لێ نابینی.

دڵنیا: خۆی لە ڕاستیا بتوانێ ناچاری بکا بێتەوە پێشەوە، ئەوە بۆ من زۆر باشە، لەبەرئەوەی تا ماوە خاڵی لاوازیم لە دەستا ئەبێ.

ئارەزوو: ئەک سڵاو لە ئەقڵت.. مەکە تۆی هێنا ئیتر لە کچان دوور ئەکەوێتەوە.

دڵنیا: تۆ باجارێ بچم بۆ لای شەنیا، ئەو ئەقڵی باش بڕ ئەکا، بزانم چ ڕێگەیەکم بۆ دائەنێ.

ئارەزوو: جا خۆ تۆ بە قسەی کەس ناکەی.. کەس هیچی پێ ناکرێ ئەوە باش بزانە.

دڵنیا: توخوا ئەگەر تۆش ئەوەندەیتر سەرودڵم بگری! ئەی جەنابت کە هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمت دێ، پێم ئەڵێی چی بکەم؟

ئارەزوو: ئا، من خوشکتم و نامەوێ توشی هیچ شتێکی خراپ بیت، بە قسەم بکە دانیشەو مەچۆرەوە بەلایا.

دڵنیا: ئەوە هەر ناااابێ! ئەی دەمی کاکم و ئەوانیتر؟

ئارەزوو: تەحەمولیکە!

Cut

دیمەنی – ١٤٤٤ –ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( تەیفور دێتە ژوورەوە بۆلای دیدەوان و لەبەری هەڵئەسێ و بەخێرهاتنی گەرم و باوەش))

دیدەوان: تۆ پێم بڵێ نیوەڕۆت کردووە؟ مام تەیفور.

تەیفور: ئەرەوەڵا نوێژەکەشم کردووەو ئینجا هاتووم.

دیدەوان: نەئەبووایە ئەوەم لەگەڵ بکەی، تۆ ئەزانی ماڵی برای خۆت لە شارەکەیایەو نەئەبووایە بچییە چێشتخانەو لۆقنتەخانە.

تەیفور: نابەخوا نەچووم.. هەر نیازی لای تۆشم هەبوو.. بەڵام حاجی ساڵحی ئامۆزام تێم ئالاو بە زۆری زۆردارەکی پەلی گرتم و بردمیەوە.

دیدەوان(( خۆ تووڕە کردنی سوعبەت)): جارێکیتر ئەوە قبوڵ ناکەم مام تەیفور، تۆ ئەزانی چیت بۆ من کرد لای خۆتان؟

تەیفور: کاشکای بۆم بکرایە شتێکت بۆ بکەم، ئەوە کەی خزمەت بوو.. خوا ئەکا تۆ بە ئێمە ڕازیی ئەبێ، پێڵاوت ئەخەینە بان دیەمان.

دیدەوان: ئەستەغفیرەڵا مام تەیفور، ئێوە گەورەی ئێمەن، قەت حەددی ئەوەمان نییە.

تەیفور: هەزار حەددتان بێ ماوۆستا گیان.. ئەوە پارەی مەڕو ماڵاتەکەشم هەموو بۆ هێناوی، وتم ئەگەر پێویستت نەبوو، ئەوسا لای خۆم بۆت هەڵئەگرم.

دیدەوان: وەڵا کارتراز بێ، شتێکی باشت کرد، ئەوە چۆن زانیت لەم کاتەیا زەیقم هههه.

تەیفور: کەواتە کاتی خۆی بوو.

دیدەوان: هەر زۆر زۆریش ماڵت ئاوا بێ یاخوا.

Cut

دیمەنی – ١٤٤٥ – ڕ/ن – ماڵی حەمەخدر:

(( باوک و غەمگین و خدرو هەرمێ))

غەمگین: ئەرەوەڵا شایەتی ئەدەم لەم دنیاش و لەودنیاش، ئەوەی بە کاکە حەمەخدر ئەکرێ، بە هەموو خەڵکی دێ دەرەقەتی ئەو وەزعە نایەن.

باوک: کەواتە تۆ لەبەر مەترسییای ڕۆڵە! ئیتر چۆن بچینە خانوویەکەوەو دەرەوە نەبینین و ئاگامان لە تۆ ببڕێ؟

خدر: نا باوە گیان (( پێکەنینی کەم)) ئەوە غەمگین شتی وای نەبینیوە، بۆیە وا گەورەی کردۆتەوە، بە هەر هەموو ئەوانەی ئەو بینیونی، خواخوایانە من سەلامێکیان لێ بکەم.. با بزانی ئەوەشیان لە ترسا کرد بوو.. زۆر بێخەمبە هیچ مەترسییەکم لەسەر نییە، ئەگەر ببوایە ئەچووینەوە دێکەی خۆمان.

هەرمێ: توخوا کاکە بەڕاست پێم بڵێ.

خدر: باوەڕکە، هیچ شتێک لە ئارادا نییە هەرمێلە گیان.. بەڵام ئەڵێم نەک یەکێ خوانەخواست نەوێرێ بەرەو ڕووی خۆم بێتەوەو یەخەی ئێوە بگرێ، بۆیە خانوویەکتان بۆ ئەگرم، تا دڵم لای ئێوەش نەبێ.

باوک: خۆی ئەوە باشە، نەک سەرباری مەغشەڵەتی خۆت، هەر بیریشت لای ئێمە بێ.

Cut

دیمەنی – ١٤٤٦ – ڕ/ د – حەوشەی ماڵی مریەم:

(( سەمەدو کامیل بەرەو دەرەوە ئەچن، مریەم بانگیان ئەکات و ئەگەڕێنەوە ))

مریەم: هەروەک جاری پێشوو شوێنم بە هیچ کەسێک نالێن، باشە؟ ئەگەر وا نەبووایە نەمانئەتوانی بێینەوە ئێرە.

سەمەد: هیچ خەمت نەبێ دادە مریەم گیان، هیچ لە ئێمەوە نادرکێنرێ.

کامیل: ئێمە لە دەرەوە هیچ جۆرە مریەم خانێک ناناسین بە دایکیشمەوە.

(( پێکەنینی هەرسێکیان ))

مریەم: ئێوە شوێنی وەرگرتن بدەن بە کابراو پارەکە ئێستا ئەهێننەوە.. بەڵام زۆر بە وریایی، ئاگاداری چواردەورتان ئەبن لە هەر سەیارەیەک دواتان ئەکەوێ، تا ئەتوانن ڕێ ونیکەن، ئەگەر هیچ چارەسەرێکتان نەما، پێش تەقەکردن، خۆم ئاگادار بکەنەوە، من چارەسەریتریشم لایە.

کامیل: ئەی ئەگەر فریا نەکەوتین؟

مریەم: هەر زەنگی تۆ هات فریاتان کەوتووم.. کامیل گیان، خۆ بە پێی خۆتان ڕەوانەی ناو ئاگرتان ناکەم؟

سەمەد: بە ئێمەش ناڵێ چۆن فریامان ئەکەوێ هههه.

مریەم: نا ئەوەیان پەیوەندیی بە ئێوەوە نییە. سەمەد گیان.

سەمەد: کەواتە دوعای خێرمان بۆ بکە ئەگەر تیا چووین؟ هههه.

مریەم: کەی وا ترسنۆک بووی سەمەد؟ کە وتم هیچ ڕوونادا، یەعنی هیچ ڕوونادا هههه.

Cut

دیمەنی – ١٤٤٧ – ڕ/ د – چایخانەیەک:

(( دیدەوان و تەیفور هەندێک عەلاگەو جلوجۆڕیان پێیەو ماندوون و دائەنیشن))

تەیفور: جا خۆ هیچت بەخۆت نەهێشت، ئەوی بۆم هێنابووی، بۆ خۆم و ماڵ و مناڵەکەمت خەرج کردەوە ماموستا.. بەخوا ئیتر جارێکیتر دووپێم نایەت بەلای تۆیا.

دیدەوان: توخوا ئەوە کەی قسەیە مام تەیفور؟ ئەو کاتە خۆشحاڵم بتوانم ئەجرتا بدەمەوە، کە قەت ئەوەم پێناکرێ.. تۆ باسی ئەوە مەکە توخوا.. جارێ با چایەک بانگکەین و دوو قسەت بۆ بکەم.

تەیفور: ئەرەوەڵا ئێستا چا خۆشە.. فەرموو لە خزمەتتام.

دیدەوان(( بانگی چا ئەکات و دواتر)): مام تەیفور خۆت ئەزانی ئێرە شارەو پیاو لە دەرگای ماڵی خۆی ئەمین نییە.. منیش بەخوا هەر ئێوە شک ئەبەم.

تەیفور: جا ماموستا گیان، جەنابت ئەمرکەو با بێم تا بەیانی لەسەر یەک قاچ لەبەردەرگاتانا هەڵتوتێم.

دیدەوان: ئەستەغفیرەڵڵا مام تەیفور ئەوە تۆ بۆ وا ڕووگیرم ئەکەی؟ تۆ برای گەورەی منیت.. بەڵام مەبەستمە بڵێم چوار پێنج کوڕی یەکی یەکییم بۆ بنێرە، گوساغ و ئازاو بەدەست بن، هیچ خەمی پارەوپولیشیان نەبێ، ئەیانحەسێنمەوە.

تەیفور: وەڵا با بچمەوە بزانم کوڕوکاڵی دێ کامیان بەکەڵک دێ و کامیان حەزی لێیەو......

دیدەوان(( قسەی پێ ئەبڕێ)): هەر لە دێکەی خۆمان نا، لەوانی دەوروپشتیش بپرسە، ئیتر تێیان بگەیەنە کە ئەبن بە دارودەستەو پاسەوانی خۆم.

تەیفور: هەر ئەوەندە؟ ئەوە بان دییەم، حەز ئەکەی دەشت بۆ ئەنێرم، هەموو جەربەزەو گوساغ و دەستوەشێن.

دیدەوان: ئەرەوەڵا تا زۆربن باشتر. ______ Cut ______

دیمەنی – ١٤٤٨ – ڕ/ د – بەر قاوەخانەیەک:

Mute

(( دڵنیا بە تەکسی لەبەردەم قاوەخانەیەک دائەبەزێت و پارە ئەدا بە تەکسییەکەو بەرەو قاوەخانەکە ئەچێ))

ـــــــــــــــ تابع ـــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٤٤٩ – متبوع – ڕ/ن – قاوەخانە:

(( سامالٚ و شەنیا ))

شەنیا: نا ناچین بۆ هیچ شوێنێک.. هەر لە مالٚی خۆمان ئەبین؟

سامالٚ: بۆ؟

شەنیا: نەتۆ پێویستیت بە سەفەرەو نە منیش لەم کاتەیا ئەمپەرژێ.. گرنگ دلٚخۆشیی خۆمانە، مانگی هەنگوینی چاولێکەرییە، تاقەتی ئەو بەزمەم نییە.

سامالٚ: دیارە شتێکی گرنگیش هەیە؟

شەنیا: با ئەو چەتیوە بێت و جەرگی ببڕم، شەوێ لە مالٚەوە بۆت باس ئەکەم.

سامالٚ: ئیشەکەیە؟

شەنیا: ئەوە ئەو چەتیوە هات، تۆ بڕۆ، با لەبەرچاوی تۆ هیچ ڕوونەدا.

(( دلٚنیا دێت و سامالٚ دوای سلاٚو داوای یارمەتیی ئەکات و ئەڕوا ))

دلٚنیا: شەنیا گیان چۆن چارەسەرم ئەکەیت بە قوربانت بم، هەر تۆ شک ئەبەم.

شەنیا: ئاسانە دلٚنیا گیان، بۆت ئەکەم بە مێو و ڕۆن.

دلٚنیا: چۆن بەساقەوبم؟

شەنیا: ئەها.. سەیارەیەکی گروپەکە بێنەو خۆشت لەدواوە دانیشەو بۆ هەر شوێنێک چوو دوایکەوە.

دلٚنیا (( شلٚەژان )): گروپی چی و دواکەوتنی چی؟ ئەوە باسی چی ئەکەی؟

شەنیا: ئەی بەساقە چۆن دوای من ئەکەوتی کون بە کون و دەرفەتێکت نەئەدامێ خۆمت بۆ یەک چرکەش لێ ونکەم، ئاوا دوایکەوە.. سەیارەی ئەو گروپەش بەرە کە دوێنێ چووی تلیاکت بۆ هێنان لە سەر سنوورەوە.

دڵنیا(( شڵەژانی زیاترو دەم و پل بەیەکا هاتن)): شەنیا تۆ باش هەستاوی؟ تەواوی؟ باسی چی ئەکەیت؟ تلیاکی چی و تەڕەماشی چی؟

شەنیا: تۆ خۆت دەمێکە ئەندامی ئەو گروپەی ڕۆڵە، چەند کاری جیاوازیشت بۆ کردوون، من ئەزانم ئێستا خەمی ئەو پارەیەتە کە بڕیارە ئەو بۆت وەرگرێ، ئەگینا تۆ کەی لە خەمی کوڕو موڕا بوویت؟

دڵنیا: شەنیا تۆ ئەم قسانە لە کوێوە ئەهێنی؟

شەنیا: لە سەرچڵەوە، کەپڵەکەت.. بۆ ناڵێی نایناسم؟

دڵنیا: بەڵام من ئەندامی هیچ گروپێک نیم بەخوا.. تەنها ئیشم بۆ سەرچڵ کردووەو ئەو ئیشی ئەدۆزییەوەو من ئەمکرد، ئەویش بۆ ئەوەی بمهێنێ.

شەنیا: ئێستا هەموو شتەکان کەوتوونە ڕوو.. سەرچڵ هەر لە بنەڕەتەوە تۆی نەویستووە ئەوە بزانە.. بەڵام توانی بتکا بە ئەندامێکی چالاکی گروپەکەو بازرگانیی تلیاکیشی پێکردی.

دڵنیا(( ئەیەوێ هەستێ)): من ئێستا ئەچم لای پۆلیس دان بە تاوانەکەما ئەنێم و ئیتر چی ڕوو ئەدا با ڕووبدا.

____ گەڕانەوەی هەیە ____________ Cut ________________

دیمەنی – ١٤٥٠ – ڕ/ د – بەر شوقەکانی ماڵی حمەخدر:

(( خدرو باوک و غەمگین و هەرمێ بەرەو سەیارەکەی خدر ئەچن))

باوک: بەس تووو ئەو زاتی خوایە حمەخدر، با خانوەکە فەریع بێت و ڕۆشن بێ، زۆر ڕقم لە خانووی دڵتەنگە.

خدر: باوکە چووم بینیم، بە دڵی خۆتە زۆر دڵنیا بە، پەنجەرەشی تیایە.

هەرمێ: ئەی لە کاکە حمە خدر؟! ئەی بۆ خانووی بێ پەنجەرەش هەیە؟ هەهە.

خدر: ئەیچۆن هەرمێلە گیان، لە زیندانا پەنجەرەی ئاسایی ماڵان نییە. هههە.

باوک: ئەک بەزیای خێرم نەکرد، بۆ بیرت لە زیندانیش کردۆتەوە بۆی بچین؟

(( پێکەنینی هەموو))

غەمگین(( گاڵتە)): ئێ قەیچێکا ئەویش خۆشە ههە.

Cut

دیمەنی – ١٤٥١ – ڕ/د – بەر خانوویەک:

(( سەمەد لە دەرگا دێتە دەرەوە، جانتایەکی گەورەی بە دەستەوەیە قورسە.. کامیل بە سەیارەکەوە دێت و لە بەردەمیا ئەوەستێت.. بە پەلە دائەبەزێت و هاوکاریی سەرخستنی جانتاکە ئەکا))

کامیل: بێ کێشە بوو.

سەمەد: خێرا دەرچۆ.. با بێ کێشە بین.

(( بە خێرایی سەیارەکە ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٤٥٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٤٩ –ڕ/ د –قاوەخانە:

شەنیا: دانیشە، سەرچڵ هیچی نەکردووەو لە هیچ شوێنێکیش نەبینراوە.. ئەو وێنانەی کە من بینیم، تۆو دوو ژن و دوو پیاون ئەوە ئەکەن، سەرچڵی داماو بڵێ چی؟ هیچی بۆ نابێ.. تۆ بازرگانەکەی.

دڵنیا: ئەڵێم ئەو هەڵیخەڵەتاندووم.

شەنیا: بەڵگەت هەیە؟ .. نا.. بەڵام من ئەم بەڵگانەی تریشم لایە کە دوام کەوتوویت.
(( کۆمەڵێک وێنەی بۆ دەرئەهێنێت))

دڵنیا: ئەی ئێستا تۆ ئەتەوێ بگەیتە کوێ؟ چیت لە من ئەوێ خۆت و سەرچڵ؟

شەنیا: خۆ من داوام نەکردی بێی بۆ لام، تۆ داوای منت کردووە.. بە ئاقڵی سەرچڵت بۆ ئەدۆزمەوەو بچۆرەوە لەگەڵیا کار بکە لە گروپەکەتانا، بەڵام ئەمجارە وەک دوو مافیا، نەک وەک ئاشقەو باشقە.

دڵنیا: یەعنی هەر لە هیچ من بووم بە مافیا؟

شەنیا: ئیتر ئەوەیان کەیفی خۆتە.. ئەگینا قازانجی ئەوەی دوێنێت وەرناگری.

دڵنیا(( تێکچوون)): ئەی هاوار! باشە من چیم لە مافیا ئەچێ (( بە خۆیا ئەڕوانێ))

شەنیا: تۆ هەموو سیفاتێکی مافیات تیایە بۆیە هەڵبژێرراوی.. گاڵتەت بە هەست و سۆزی خەڵکیتر دێت.. چاودێریی ئازیزترین هاوڕێت ئەکەی بێ ئەوەی هیچ باکت هەبێ، لەگەڵ پیاوکوژا هەڵئەسی و دائەنیشی.. ئەی ئیتر پێم ناڵێی مافیا چییە؟ هەر ئەوەیە بە خۆتان ئەڵێن گروپ و ناڵێن مافیا.

دڵنیا: حەیف شەنیا وا لە من گەیشتووی؟!

شەنیا: وەڵا هیچ حەیف نییە، هەموویم بە بەڵگەوە پێوتووی.

دڵنیا: ئێستا ئەو خوێڕییە لە کوێیە؟ پێم بڵێ.

شەنیا: مەڵێ خوێڕی.. ئێستا ئەو بەرپرستەو یەکێکە لە پیاوکوژەکانی گروپەکەشت، ئاگات لە خۆت بێ.. زمان درێژیی لەگەڵ ئەو کەسانەیا زیانی هەیە.

دڵنیا: باشە لە کوێیە؟

شەنیا: توخوا وەک من ئاقڵ و سال دانیشتیایە باشتر نەبوو لەم هەموو سەرێشەیە.. بەڵام خۆ تۆ بە قسەی کەس ناکەی.

دڵنیا: پێم بڵێ لەکوێیە وا مێشکم ئەتەقێ، مەیفەلسەفێنە!

شەنیا: لەبەر خاتری تۆ پێی ئەڵێم بەیانی لە شوێنێک بتبینێ، بەخوا ئەویش لەبەر خاتری تۆ، ئەگینا من تاقەتی پیاوکوژو تلیاکچیم نییە، بە خەویش بیانبینم ئەتۆقم.

Cut

دیمەنی – ١٤٥٣ – ڕ / ن – چاپخانەیەک:

(( لە چاپخانەیەکدا سێ کرێکار هەن و تیرۆژو ئامۆش لە لایەکیترەوە قسە ئەکەن))

تیرۆژ: بەڵێ دوێنێ چووم بۆ ماڵی ڕاماڵی ڕەحمەتی، بە دوای ئەوا کە بڵێم ئێرە ئەکەمەوە..، کە بۆم باسکردن، وتیان نەوەڵا ئێمە کوڕمان نییە ناوی ساماڵ بێت، کوڕێکی بچووکیان پێ نیشاندام، وتیان هەر ئەو برایەی هەیە ناوی ئوسامەیە.

ئامۆ: ئەی ئەو ساماڵ ناوە کێ بوو؟ بۆچی داوای تۆی کردبوو؟

تیرۆژ: نازانم، ئەو ون بوونەی ونیش بوو، دەرنەکەوتەوە.. تۆ بڵێی جێی مەترسیی نەبێ کاکە؟

ئامۆ: نا بەساقەوبم، هەر کاتێ دەرکەوتەوە، یان هەر شتێک ڕوویدا، بە پەلە ئاگادارم بکەرەوە، چاویشمان لێت ئەبێ نەترسی، باشە تیرۆژ گیان؟

تیرۆژ(( بە خۆشییەوە)): من تۆم هەبێ لە چی بترسم کاکە گوڵەکەم؟

(( بەرەو دەرەوەی چاپخانەکە دێن))

Cut

دیمەنی – ١٤٥٤ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و عارف و سەرچڵ و زاهید، هەردیش لای دەرگاوە وەستاوە، یان لە پەنجەرەکەوە دیارە لەودیوەوە ))

عارف: ئێ ئەو چەتیوە هەر بە قڕ ڕاکێسان بێنن بۆ ئێرە.. یەعنی چی پارەی پانزە بیست ساڵمان بخوا؟ ئەوەندە بێ دەسەڵاتن؟

دیدەوان: بێدەسەڵات نیین عارف گیان، بەڵام وا خەریکە قڕ بخەینە خۆمان بێ ئەوەی حوکمەت دەستێکی بۆ بردبین، ئەوە ڕەمزی و هەتیوە حەماڵەکەو ئەو هەتیوەیتر......

سەرچڵ: ڕاماڵ.

دیدەوان: ئا ڕاماڵ و ئەمیشی بێتە سەر؟

عارف: پێویستیی ئیشە ئەی چۆن؟ بە تایبەت کەسیان وەک ئەمی نەکردووە.. تەماعی تەماع نییە.. وەڵا پارەی ئیشێکیشی ببردایە هەر ئەمانوت لێیگەڕێ زەعیفەیە گوناحە؟ بەڵام .............(( سەربادان ))

دیدەوان: زۆری نەماوە، هەمووی ئەگەڕێتەوە بێ ئەوەی دۆلارێکی لێ کەل بووبێت.. تۆ بڵێی لێیگەڕێم بیخوا؟

عارف: جا دوایچی؟ دوای ئەوەی ئەو ئیشە گەورەیە لە کیس چوو؟

زاهید: ئەگەر ویستتان بیکوژن؟ با گوڵزار بیکوژێ، زۆری پێخۆشە خەڵک بکا بە نیشانە.

عارف: خەریکە تێک ئەچم.

Cut

دیمەنی – ١٤٥٥ – ش/ن – خانووی تازەی باوک:

(( خدرو باوک و غمگین و کارە دانیشتوون و هەرمێ چا تێ ئەکاو یەک دووانێکیان دان پاک ئەکەنەوە ))

باوک: زاهیرەن خۆشە.. بەڵام ئیتر ماوەیەکی زۆرو هەر لەناو چواردیواریشا.. بۆ ئەوسا نازانم بڵێم چی.

خدر: نا نا باوکە گیان، ناهێڵم زۆر بخایەنێ، هەر یەک دوو هەفتەو تا مانگێ ئەوپەڕەکەی.. تا ئەم کێشانەی ئیشەکەم یەکلا ئەکەمەوەو دەستم بەتال ئەبێ و سەرقاڵ نابم.. ئەوە کوڕەکانیش چوون تەلەفزیۆن و سەتەلایت و هەموو شتێکتان بۆ بێنن، چۆن ئەهێڵم بێتاقەت بن.

هەرمێ: ئەی خۆت سەرمان لێ نادەی کاکە؟

خدر: جا گەر سەرتان بدەمەوە، هەر دەستمان لە خۆمان نەدایە باشتر بوو.. من ئەمەوێ کەس بەم جێیەتان نەزانێ.

غەمگین: ئەی منیش نەچمە دەرەوە؟

خدر: نەوەڵا غەمە گیان نابێ تۆش بچیت.. ئەوە با کارە ژمارەکەت بداتێ، هەر کاتێ بێتاقەت بووی، با سەردانت بکا.. ئەو کوڕەی لاشتان جێ ئەمێنێ، ئەزنیفچی و تاوڵەچییەکی باشە، ناهێڵێ بێ تاقەت بن.

Cut

دیمەنی – ١٤٥٦ – ش/ن – ماڵی هەندرێن:

(( مناڵ و هەندرێن و تافان سەرقاڵی خۆ گۆڕینن و بەدەم جرتوفرتەوە))

باڵا: دایکە بلوزە سوورەکەم دیارنییە، دە توخوا با لەبەری نەکەم بەخوا گەرمامە.

هەندرێن: کچم ئەوە ژوورەوە گەرمە دەرەوە ساردە، ئەگینا وەک جاری پێشوو نەخۆش ئەکەوی و دیسان دەرزیت لێ ئەدەن.

باڵا(( بەرەو ژووری خۆیان)): ئۆففففففففف!

تافان(( دەنگ لە ژووری ترەوە)): دە توخوا ئەگەر دڵی کچەکە سەغڵەتکەی هەندرێن، لەوەتای هەیە تەنها هەر ئەمشەو دڵی خۆشە.

هەندرێن: با نەخۆش نەکەوێ ژنەکە، ئەڵێم با خۆشییەکەی لێ تاڵ نەبێ.

باڵا(( دێتەوەو بلوزێکی سووری بەدەستەوەیە، فڕێی ئەدا بۆ باوکی)): ها دەی ئەبێ تۆ بیکەیتە بەرم.

هەندرێن: وەی بەسەرچاو.

کلێپە: من خۆم گۆڕی تەواو.

هەندرێن: ئەک ئافەرین بۆ تۆش.

تافان: دەی درەنگە، منیش تەواو.

(( خۆگۆڕین تەواو ئەبێ و بە خۆشییەوە ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٤٥٧ – ش / ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن مۆبایلی پێیە.. تریفەسەیری ئەکات و تیرۆژ جل ئوتو ئەکا ))

نارەوەن: ئەی چیتکرد ڕۆڵە هەر تەواو نەبوو؟ ............... دەی باشە کەواتە بە سووسە بین؟ ....... چۆن؟؟؟؟؟ ....... هەهە هەی ساختەچی! باشە وا دێن دەرگات لێ ئەکەنەوە. (( مۆبایل دائەخاو لایئەبا )) لە پێشا ئەڵێ دوورم کەچی لەبەردەرگایە هەهەهە.

(( تریفە ڕائەکا دەرگای لێ بکاتەوە ))

تیرۆژ: تۆ سەیری سەیریکە چۆن ڕا ئەکا، وریا بە وەک کاک زوبێرت لێ نەیەت.

نارەوەن: هەهەهە ئەی بۆ نەتوت نیگار؟

تیرۆژ: ئاخر کاک زوبێر ملی پێچراوە، هی نیگار خان نەپێچراوە.

(( پاش کەمێک خدرو تریفە دێنە ژوورەوە.. پاش سڵاو ))

خدر(( بە سوعبەتەوە خۆ تورە کردن )): ئەو پەلەپەلەت لە چی بوو؟ تۆ ئەزانی چیم ئەکرد؟

نارەوەن: نازانم وتت لەگەڵ باوکم لای دکتۆرین نەساغە، وا ئەگەڕێمەوە. منیش خراپم نەوت، وتم دەستوبردکە.

خدر: لە نیوەڕۆوە کارەو ئەحە بۆ شوقەو خانووی ئامادە ئەگەڕێین.. شەو وەک ئەوەی بۆ میوانی بچێن، هەرسێکیانم بردو خستمنە خانووی تازەوەو پێشموتوون، بۆ هیچ شتێک نایەنە دەرەوە.. کەسێکیشم لا دانان بۆ پارێزگاریی و شتومەک کڕین.

نارەوەن: دەستت خۆش بێ وەڵا هەر ئەوەت چاککرد، توخوا با ئەوان تێوە نەگلێن.

تریفە: جا ئەوە گران نییە؟ بۆ نەتبردنە خانووەکەی من؟

خدر: با لە شوێنێک بن کەس نەزانێ کەسی منن.. دوێنێ وا توندوتیژ نەبوومایە لەگەڵیا، خۆ ڕەنگە شتێکی لە غەمگین بکردایە.

نارەوەن: نا ئەوە خۆ نواندن بوو، یەعنی هەموو شتێکم لەدەست دێ!

تریفە: خۆ هیچ نازانن لە مەسەلەکەی خۆمان؟

خدر: نا خەمت نەبێ، تۆ پارێزراوی بە بێ شاردنەوە ههە.

(( پێکەنین ))

تیرۆژ: ئەی چۆن؟ باوکی و ئەوان ئەشارێتەوە، بەڵام تۆ ئەبێ لەبەرچاوان بی ڕۆڵە هههە.

نارەوەن(( بۆ خدر و ئاماژە بۆ تیرۆژ)): نابینی چەند کەیفی سازە؟

خدر: با تێبینیم کرد، ئەوە بەچی تیرە گیان؟

نارەوەن: کاکی لەگەڵیا چوو و چاپخانەکەی بۆ کردەوەو ئەمڕۆ دەوامی کرد.

خدر: ئەک پیرۆزە بە دڵی خۆش، جەنتڵمانێکیشی بەدوادا بێ.

تیرۆژ: ئیشەکەم زۆر مەبەستە.. جەنتڵمان بۆ تریفە من نامەوێ هههە.

خدر: ئۆو زۆر سوپاس.

نارەوەن: بەڵام تۆ وەرە وەرە خدر، شتێکی سەیر ئەڵێ لەسەر ئەو کوڕەی بناوی برای سامالەوە هاتبوو.

خدر: تۆزێ خێرا، با بچین بۆ تەعزێکە.

تریفە: عەسریش هەر لەوێ بووی دەستخۆش.

Cut

دیمەنی – ١٤٥٨ – ش / ن ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیاو سامالّ ))

سامالّ: ئەو چی بوو ئەو هەموو پارەیە باوکەڕۆ؟ خۆ هەموو ئەم ولآتە ئەوەندەی نییە.

شەنیا: ئەو پارەیە تەنها بۆ من و تۆیە.. شتێکی لێ بکەو ڕەوانەی یەکێ لەو ولآتانەی دەرەوەی بکە.. ئەوسا ڕۆشتنێک ئەڕۆین، لە خەویشا نەمانبیننەوە.

سامالّ: وایە، ئەو پارەیە هیچ سوودێکی نییە لەم ولآتەیاو هەر ناکرێ دەرخرێ، بە نوێژی نیوەڕۆ کەلەپاچەمان ئەکەن.. هەر ئەبێ بینێرینە دەرەوە.

شەنیا: ئەوە پارەی سەگوسەگبابیی هەموو ئەوانەیە ئەو گروپەیان دروست کردووە.

سامالّ: بۆ ئەمانە ڕەگ و ڕیشەیان هەیە؟ زۆر کۆنن؟

شەنیا: ئۆو هەر مەپرسە.. زیاتر لە بیست سالّە بۆ منی کۆئەکەنەوەو منیش نەک هەر تۆم کرد بە هاوبەشی ژیانم، تۆم کرد بە دەولّەمەندترین پیاوی دنیاش.. ئیتر ئیشی مەترسیداریش ناکەین و لە هەموو کەسێکی دنیاش باشتر ئەژیین.

سامالّ: ئەبێ زۆر بە خێرایی دەست پێ بکەین.. وەک ئەلّێی دیدەوان گومانی لێتە، باوەڕ مەکە لێگەڕێت بژیین.

شەنیا: بۆیە پەلەی هاوسەرگیرییەکەم بوو، من ئەزانم تۆ خەلّکی باش ئەناسیت و ئەتوانی ئەوە بکەی.. ئیشت ڕێکخراوە ئاگام لێتە.

سامالّ: چۆن ڕێکخراوییەک؟

شەنیا: ئەو کاتەی خۆت شاردبۆوە، ئەوەی تۆ کردت بۆ بینینەکەت، بە ڕێکخراوی خاوەن ئەزمون نەبێ نەئەکرا.. هەر خۆشم نەمزانی بە چ پلان و دەستوبردییەک گەیشتمە لای تۆ.. سەرەتا گومانی زۆرت لا دروست کردم، ئەوە بوو دواتر ڕەواندتەوە.

سامالّ: هەموو ئیشێکی من بە ڕەفیق و برادەرەو دلّنیابە، بە پارەیەکی کەم، ئەم پارەیەش هەر بەوان ئەکەم و ئەیگەیەنمە شوێنی ئارام.

شەنیا: بە قسەم بکە با ئەم ماوەیە شوێنمان نادیار بێ.. بۆ نمونە ئاسایی بێ بە لاتەوە تۆ لە شوێنێک و من لە شوێنێک بم.. خۆم دیدەوان و هەتیوچەکانی لای بەڕێ ئەکەم، گرنگ ئەوەیە تۆو پارەکە پارێزراو بن.

سامالْ: ئەی هاوسەرگیرییەکەمان؟

شەنیا: ئەمە لە هەزار هاوسەرگیریی گرنگترە، با بیگەیەنینە ولاْتێک، ئەوسا ژیان بە دلْی خۆمان ئەگوزەرێنین.

سامالْ: ئەی بۆ نەچینەوە باخەکەی ئەو هاوڕێیەم و خۆشمان لەوێ بشارینەوە.

شەنیا: بەڕێکردن هەیە سامالْ، نەک خۆشاردنەوە، ئەوە یاساو ڕێسای گروپەکەیە.

سامالْ: مانای چییە؟

شەنیا: ئەوەندەی شارەزایان بووم، ئەکرێ بەڕێیان بکەیت و کاتیان پێ بکوژی، بەلاْم کە خۆت شاردەوە، ئەتدۆزنەوەو ئەتکوژن.

Cut

دیمەنی – ١٤٥٩ – ش / ن – ژووری تەنیشت زیندانی دیدەوان:

(( دیدەوان تێل ئەکاو ڕەوەزو سەرچڵ و زاهیدو گوڵزار))

دیدەوان: باشە کچم هەفتەیەک مۆڵەتتان بێ، بەڵام دوای ئەوە کابرا بێنەو با دەست بکەین بە بەرنامە دانان، لای ئێمەوە هەموو شتێک ئامادەیە، تەنها چاوەڕوانی ئەو کوڕەی لای تۆین، مێردە گوڵەکەت هههه.

شەنیا (( دەنگ)): زۆر سوپاس، هەفتە بۆ ئێمە بەسەو ئەگەڕێینەوە سەر ئیش کاکە دیدەوان گیان، دووبارە سوپاس، ئاگاتان لە خۆتان بێ تکایە، خۆشیەکەمان تێک نەدەن ها؟ هههه.

دیدەوان: سەرچاو، خەمت نەبێ، ئێوە لە خۆشی خۆتانا نقوم بن و بیر لە ئێمە مەکەنەوە تا ئەگەڕێنەوە.. بێخەمبن. (( مۆبایلەکە دائەخاتەوە))

سەرچڵ: هاوسەرگیرییەکەی زۆر بە پەلە بوو.. من هەست ئەکەم شتێکی تیابێ.

دیدەوان: سەرچڵ گیان بیرت نەچێ، ئەزمون زۆر گرنگە بۆ خەڵک.. ڕاستە ئەم کچە توانای بیرکردنەوەو پلان دارشتنی لە کەسێکی ئاسایی زیاترە.. بۆیە خۆی لێ ئەگۆڕێ و وا ئەزانێ، ئیتر کەس نازانێ بیر بکاتەوەو کەس ئەقڵی بە هیچ ناشکێ.. ئەوە کەم ئەزمونییەکەیەتی، بۆیە زۆر بە ئاسانیی تێ ئەکەوێ.

ڕەوەز: بەخوا باشی ناناسی کاک دیدەوان.. ئەو کچە فرتوفێڵێکی هەیە شەیتانیش زەفەری پێ نابا.. هەر خۆی ئیبلیسە ئیبلیس!

سەرچڵ: منیش ڕام وایە بە بچووک و ئاسانی نەزانین، ئەو ڕەمزی بە جۆرێک لەناوبرد لە خەیاڵی کەسمانا نەبوو.. بە یەک پەیوەندیی لەگەڵ تۆیا، هەموو شتێکی بەسەر ڕەمزیا هەڵگێڕایەوە.

دیدەوان: ڕەمزی خۆی هیچی لە بارا نەبوو.. سەیری ئەتواری ڕەمزی بکەن ئەوسا ئەزانن شایانی زۆر لەوە خراپتر بوو.. ئادەی زاهید تۆ بیڵێ.. بۆچی نیگارو مێردەکەی پێ توشی ئەو وەرگەڕانە قورسە کردی؟

زاهید: وتی هەرچۆنێکە ئەبێ شتێک لە سەیارەکەیان بکەی، هیچیان دەرنەچن.. نابێ کەس ژنی کاک دیدەوان بهێنێتەوە، هێڵی سوورە.. ئەبێ ئەو ژنەش سزا بدرێ، کە پێگەی خۆی نازانێ.

دیدەوان: ئەی بۆ ئەیویست منیش لەناوبەرێ؟

زاهید: لەبەرئەوەی بە نیازی ژنەکەیتری دارەوان بوویت.

دیدەوان: ئەها ئەو کابرایە چەند تورەهات بوو؟ ئەو دارەوان پەرست بوو، کارێکی وای تێکردبوو چاوی لەو زیاتر کەس نەبینێ.. لە کاتێکا من کە ئەم گروپەم دروست کرد.. بیرم لە بەرژەوەندیی و پارە پەیا کردن کردەوە لە هەر شوێنێک و لە گیرفانی هەر کەسێکا بێ.. بەڵام دارەوان، لێی تێکداین، خۆپەرست بوو، پێی وابوو ئەبێ هەموو خزمەتی بکەین.. بەس خۆم ئەزانم چەند فێڵی لە ئێوە کردووە بۆ تێپەڕاندنی مەرامی خۆی.

سەرچڵ: ئیتر من ئەڵێم حسابی تەواویش بۆ شەنیا بکە، ئەویش بەچکە ڕەمزییە.

دیدەوان: چۆن نایکەم؟ من حساب بۆ وردودرشتی هەمووتان ئەکەم، بەو تافانەشەوە کە تازە هاتووە.. ئا باش بوو ناوی هات.. مێردەکەی فت بکەین، ئەو ڕێگەی ئاچوغ ئەبێ.

ڕەوەز: بۆچی بکوژرێ؟

دیدەوان: یەکەم ئەو هەواڵی سەفەری ژنەکەی گەیاندبووە ئاسایش، کەواتە مەترسیدارە.. دووەم کەوتۆتە چاودێریی ژنەکەی و هاتووە بۆ لای، سێیەمیش ئەو ژنە ئەڵێ تا ئەو هەبێت، ناتوانم پارە لەماڵەوە دابنێم.

گوڵزار: خۆی ڕازییە بۆی بکوژم؟

دیدەوان: قسەم لەگەڵ کرد، حەز ئەکا!

سەرچڵ: بە قسەی من ئەکەن دەست لە کەسێک مەدەن گومانی ئەوەی لێ بکەن سەر بە پۆلیس و ئاسایش بێ.. بەخوا بەخوا هەموو دنیامان لێ ئەهێننەوە یەک. ـــ Cut ـــ

دیمەنی – ١٤٦٠ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

بەهێز: بە ڕێککەوتن ئەکرێ لەگەڵ ئاسایش.

ئاری: کەواتە ئامادەبین؟

بەهێز: پەلە مەکە، با لەگەڵ ئەوانیش دانیشم و بەرنامەی چالاکییەکە ڕوون بێت.. کە نەقیب ڕاهۆز تەلەفونی بۆ کردم، چۆنێتیی چالاکییەکەی بە تەواوەتیی باسکرد، بەڵام ماوەتەوە سەر هاوبەشیی ئێمە، کە کوشتنی ڕەمزی وەک دادوەر فرمانی کردووە سۆراخ و کۆکردنەوەی بەڵگەکان لە دەسەڵاتی ئێمەدایە.

ئاری: ئێمە ئامادەین، کەوابێ تۆ بچۆ بۆ کۆبوونەوەکە.

Cut

دیمەنی – ١٤٦١ – ڕ/د – لادێی نزیکە شار – باخی  ماڵەکەی ساماڵ:

((ساماڵ و دلێرو سەرخێڵ و ڕێبین))

سەرخێڵ: من دەبڵەکەی هەژاری پورزام ئەهێنم ئەوە بەسە؟

ساماڵ: کورە دەبڵی چی ماڵم ئاوا کردی؟ لۆرییش بێنی بەس نییە.. دلێر تۆ ناتوانی دوو تەنییەکەی باوکت بێنی؟

دلێر: نایداتە دەستمەوە، ئەڵێ ئەمە سەیارەی ئیشە.

ساماڵ: شتێک بکەن هەر وا بێ بتوانین نیوەی بێنین جارێ.

ڕێبین: وایە ئەبێ بە چەند کاروانێ بهێنرێ.

سەرخێڵ: دەی کەوابێ شتێ هەر پەیا ئەکەین.. پەلەی لێ ناکەین.

ساماڵ: ڕێبین ترس داتنەگرێ.

ڕێبین: ئاخر من بیر لە دووابییەکەی ئەکەمەوە، هەزار چاوی لەسەرە.

ساماڵ: هەموو چاوەکانم داپۆشیوە، ئەوەندە زۆرە هی بێ پەروایی نییە

دلێر: ڕێبین ڕاست ئەکا، هەر لەلایەکەوە تێوە ناگلێین.

ساماڵ: چواردەوریم تەنیوەو دڵنیابن، وەک چۆن موویەک لە ماست دەربهێنن ئاوایە.. ترسم ناوێ.. تەنها بێخەم بن و هیچیتر، پارێزراوین.

———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٤٦٢ –ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( دیدەوان لەسەر قەنەفەی ژووری نارەوەن دانیشتووەو هاوکار چای بۆ ئەهێنێ))

هاوکار: فەرموو قوربان!

دیدەوان: ئەوە شاژنت لە کوێیە؟

هاوکار: زوو هات، وتی ئیشێکی باجی دەرامەتم هەیە زوو ئەگەڕێمەوە، داوای خۆمیان کردووە.

(( عارف دێتە ژوورەوەو دوای سڵاو))

عارف: لە دەستچوو، وتی فرۆشراوە.

دیدەوان: کێشە نییە، داوای زۆرتر بکە.

عارف: داوام کرد ئەڵێ مانگ و نیوێکیتر.

دیدەوان: ئۆو زۆر دوورە.. کێشە نییە تا ئەو کاتە بیرۆکەو هێزەکەش گەشە ئەکات و ناکەوینە هەڵەوە.. خدریش وتی من لە اوەی مانگێکا سی چەکدار کۆ ئەکەمەوە.

عارف: من ئەو هەتیوە ناناسم، زۆر لە خۆی ڕائەبینێ.. هەر فشەکەر دەرنەچێ باشە؟!

دیدەوان: نا فشەکەر نییە، منیش لێی ڕائەبینم.. گەیشتوومەتە بنج و بنەوانی، مادام لێمان ئەترسێ، مانای وایە ئەویش ئێمەی خوێندۆتەوە.

عارف: وا دەرناکەوێ بترسێ!

دیدەوان: با.. شەو کەسوکارەکەی خۆی بردووەو نەگەڕاونەتەوە تا ئێستا.. ڕەنگە بردبێتنیەوە بۆ لادێ، تا توشی بەڵا نەبن.

عارف: کەواتە خۆپەرستیشە، یاری بە خۆی و ماڵ و منداڵی نارەوەن و ئێمەو سی کەسیش ئەکا، بەڵام باوک و خوشکی خۆی پارێزراو بن.

دیدەوان: ئەویش یەکێکە لە سیفاتە باشەکانی.. بەو خۆ پەرستییە خۆی ئەپارێزێ، هەم لە دوژمن و هەم لە ئێمەش. بەوەشماڵەکەمان ئەپارێزێ تا تووشی کێشە نەبێت لەگەڵمانا.

عارف: ئەوە ڕاستە.. بەڵام بەخوا هەر سەروچاویم بە دڵ نییە.. من هەروام کەسێ خۆی بەزل زانی، ناچێتە دڵمەوە.

دیدەوان: زەڕڕە لێی مەترسە.. کلکی لەمشتمایە خالۆ.. بچووکترین جووڵەی چاودێریی ئەکرێ.. نارەوەن و تاقمەکەی (( بەدەست ئامادە ئەکا )) ئەئاوا لە بندەستمان.. ماڵی نارەوەنیش هیچیان لە ماڵی باوکی کەمتر نییە بۆ ئەو.

——— گەڕانەوەی هەیە ——— Cut ———

دیمەنی – ١٤٦٣ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ و عەبەو دڵەو سەفین و کارە))

کارە: کەواتە من بچمەوە سەر ئیشی خۆم؟!

هاوڕێ: ئەی چیت پێ ئەڵێم؟ ئیتر دڵە لێرە دائەنیشێ وەک پێموتی.. عەبەو سەفینیش کاک حەمەخدر ئەڵێ بەو سەیارەیەی بۆم داناون، دوور بە دوور دوای من و نارەوەن خان ئەکەون بۆ هەرشوێنێک چووین.

عەبە: ئەی تریفەخان؟

دڵە: ئەی نەیوت من ئاگاداری ئەو ئەبم؟

سەفین: ئەی ئەگەر هەردووکیان لە یەک کاتداو هەر یەکەیان بە لایەکا چوون؟

هاوڕێ: شتی وا نابێ.. قوڕ بەسەر کاک حەمەخدر پشتی بە کێ بەستووە!

سەفین: یاخوا نەگاتە تەنگانە، بەڵام کە گەیشت خۆت ئەیبینی سەفین کێیە؟

هاوڕێ: سەفین وەکو عەبەو دڵە بە، ئەها هیچ خۆیان هەڵنافشێنن؟!

(( نارەوەن و حەمە خدر دێنە دەرەوە))

هاوڕێ(( تورە بۆ عەبەو سەفین)): ئەرێ ئەوە نایانبینن ئەڕۆن؟ ئەبێ من پێتان بڵێم؟

(( عەبەو سەفین بە پەلە هەڵئەسن و ئەچنە سەیارەیەکەوە کە لەوێ وەستاوەو دوورو نزیک دوایان ئەکەون))

کارە: ئەی بۆ حەماڵ چی بکەین؟ بەخوا من بە تەنیا پێم ناکرێ!

هاوڕێ: پەلە مەکە، هاکا پەیابوون.. پێنجیتری هێناوە، بەخوا لەوانەیە ئیتر هەر ئیشت بەر نەکەوێ هاهاها.

Cut

دیمەنی – ١٤٦٤ – ڕ / د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( سەرچڵ و گوڵزارو ڕەوەزو زاهید ))

ڕەوەز: ئەگەر لە بەشی خۆی زیاتری داوا کردو ڕێی لێگرتین، ئەویش ئەکوژین چییە؟

سەرچڵ: ئەو پارەیە بە خوێنی خەڵکی وەک من و ئێوە پەیا کراوە.. ناکرێ دیدەوان و عارف و خدرو شەنیا بیخۆن.

گوڵزار: ئافەرین، کێ دەستی هێنایە ڕێمان خۆم ئەکوژم.

زاهید: ئەرێ دە باشە تۆش فشەکەر دوانت کوشتووە لە دوورەوە، ئیتر وا ئەزانی هەمووی وا بە ئاسانیی ئەکەوێتە بەردەستت.

گوڵزار: کێ خۆی زۆر بە ئازا ئەزانێ، پێم بڵێ و با تەختیکەم بۆت.

(( پێکەنینی هەموویان ))

سەرچڵ: من چاوەڕێ ئەکەم بزانم چەندەو لە کوێیە؟ دوای ئەوە وا باشترە ئیتر ئیشیان لەگەڵ نەکەین و واز لەم ئیشە قۆڕە بێنین.. هەر ڕۆژێ پێوە بین پێوە ئەبین.

ڕەوەز: بەخوا تازە من چۆتە خوێنمەوە دەستی لێ هەڵناگرم، چێژی لێوەرئەگرم.

زاهید: دەی بە گۆڕی ئەو کاکە ڕەوەزە، من بەشی خۆمم دەستکەوێ، هەر لەم وڵاتەشا نامێنم.

ڕەوەز: کێ ئەڵێ تۆ پێش من ناکوژرێی هەتیو؟

سەرچڵ: جا مادام کوشتنمان لە ڕێیە، وازهێنانی باشترە.

گوڵزار: ڕەوەز ڕاست ئەکا، چێژی تیایە، ڕەنگە ئێوە چێژتان لە کوشتنەکە وەرنەگرتبێ (( وەک پاروویەکی چەوری لێبێ، بە زمان دەم و لێوی ئەلێسێتەوە )) نازانن چەند خۆشە واووووو.

Cut

دیمەنی – ١٤٦٥ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٦٢ - ڕ/ن –کۆمپانیای تازە:

(( دیدەوان دڵخۆشەو تەلەفون ئەکا و عارف دانیشتووە))

دیدەوان: زۆر سوپاس، دەستخۆش دەستخۆش ئافەرین، مژدەیەکی خۆش بوو. (( مۆبایل دائەخاتەوە)) هەههە ئەوە پارەکەش دۆزرایەوە باشە کاکە هەر خەمت بوو؟

# (( ئەڵقەی حەفتا ))

عارف: لای شەنیا دەرکەوت؟

دیدەوان: ئەی خۆ لای دایکیشم نییە؟ هاهاها.

عارف: ئەیهێنێتەوە؟

دیدەوان: نا هەر ناشزانێ بە جێگەکەیمان زانیوە.. شەو ئەچین و بۆی بەتاڵ ئەکەینەوە، ئیتر ئێمەش وەکو ئەو ئەڵێین نازانین لە کوێیە.. هەههە تۆ لێگەڕێ ڕابواردنەکە زۆر خۆش ئەبێ.

عارف: بەڵام بەڕای من جێی ناپاکی وا نەکرێتەوە لە گروپەکەدا.

(( خدرو نارەوەن دێنە ژوورەوەو سڵاو))

Cut

دیمەنی – ١٤٦٦ – ڕ / د – شوێنێک لە دەرەوە:

(( سامالٚ تێل ئەکا ))

سامالٚ: بەلٚێ بەلٚی وەک ئەوەی خۆت فەرمووت، هەرسێکیانم باش تێست کردو زۆر باش کەوتەوە.. هیچیان نایانەوێ دەستی تێوەردەن.. زۆر باشن خەمت نەبێ......... جا خۆ گەر ئەوەش بکرێ هەر زۆر باشترە.................. هەرچییەکیان بفەرمووی من ئەوە بە باشتر ئەزانم، پارە پارە نییە قوربان، بەشی یەک ولاٚت ئەکا هههههە............. بەلٚێ باشە،..... باش................ باشە................. باشە بەسەرچاو.

(( مۆبایلەکەی هەلٚئەگرێتەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٤٦٧ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا بە تەنها دانیشتووە ))

<u>شەنیا مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

شەنیا: بۆ وا دواکەوت؟ ئەبووایە دەمێک بووایە لای من بێ.. وایە، ئیشەکە قورسە، بەڵام خۆ ئەبووایە ئەویش بزانێ چۆن بەسەر ئاگرەوەم؟.. دڵنیام جێی هەمووی ئەکاتەوەو ئەیباتە دەرەوە، لەبەر منیش نەبێ لەبەر خۆی.. بەڵام ئەبێ هەموو هەنگاوێکی بە وریاییەوە لێک بدەمەوە، پارەکە هی ئەوە نییە دڵت لە ئاستی باوکیشتا بە پاکیی بهێڵێتەوە.. ئەی بۆ وتم هەریەکەو لە لایەک بخەوین؟ بەخوا بە ئیسراحەت خەوم لێ نەئەکەوت ئەوی لێ بووایە، هەر ئەوەم باش کرد.. ئەی بۆچی کە پارەکەم پێ گواستەوە سەری نەقەبڵێنم؟ ها؟ وەڵاهی بیرۆکەیە، من ئەو پارەیەم لە دەرەوە هەبێ، هەر مێرد زۆرە.. بۆ نا؟ با جارێ دڵنیا ببمەوە لەوەی گەیشتۆتە شوێنێک.!!

<u>مۆنۆلۆژ تەواو</u>:

Cut

دیمەنی – ١٤٦٨ – ڕ/ د – حەوشەی بنکەی پۆلیس:

(( ئاری هێز ئامادە ئەکات و تێل ئەکا لە کۆتاییدا ))

ئاری: گەورەم هەموو ئامادەن.

بەهێز(( دەنگ)): ئامادەبە، ئێستا خاڵی یەکگرتنەوەت پێ ئەڵێمەوە لەگەڵ هێزەکەی ئاسایشا.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

(( ئاری ئەچێتە لای ئەفسەرەکانیترو پاشان ئەگەڕێتەوە لای سەیارە پڕ پۆلیسەکەی خۆی ئەوەستێ و جیهازەکەی بەدەستەوەیە))

Cut

دیمەنی – ١٤٦٩ – ڕ / ن –ماڵی زوبێرو نیگار:

(( زوبێر لایەکی شەلەلە، شتێکیان بۆ داناوە ئاییاد ئەگرێ و بە دەستێک ئاییاد ئەکا.. سەلواو بەنازی کارەکەر بەوناوەیا دێن و ئەچن و ئیش ئەکەن))

زوبێر: ئا سەلوا گیان، وەرە باوکە، ئەم ژێر ملەم بۆ چاککە.

سەلوا: بەسەرچاو مامە گیان، وا هاتم (( شتێکی بەدەستەوەیە دایئەنێت و ڕائەکا بۆلای)) ئادەی!

نیگار: چییە زوبێر گیان وەڕس بوویت؟

زوبێر: ئەی لایەکم نەبێ چۆن وەڕس نابم نیگە گیان؟ بەڵام تۆ خۆش بی زوو ڕادێم.. هههە هەر ماوەیەکیتر بمبینە بووم بە شارەزا لە دنیای ئینتەرنێتا.. پەکی خۆم ناخەم گوڵەکەم، خەمت نەبێ.

نیگار: بەساقەوبم هەناسەکەم، خوا ئەوە بگرێ وای لێکردی.

زوبێر: ئەبووایە ئەو ڕێکەوتەمان بکردایە مادام هەردوو جەمسەرەکەی پێویستیی هەبوون.. کچێ بە قسەی پۆلیس تێنەکەوی، دەستی کەسی تیا نییە نیگە گیان، خۆت خەفەقان نەکەی بۆئەوەی بزانی کێ بووا!

نیگار: ئیتر ئەگەر خەڵکە خوا بیگرێ و ئەگەر قەزاوقەدەریشە شوکرین بەبەشی.. دەسەڵات چییە؟

سەلوا: یارەبی ئەگەر دەستی خەڵکی تیایە، هەر کەسێکە موزمەعیل بێ لە دنیای ڕۆشن.

زوبێر: هاهاها کە دوعاکەت کۆنە، نەک دایکم، نەنکیشم ئاوا دوعای ئەکرد.

Cut

دیمەنی – ١٤٧٠ – ڕ / د – بەر ئۆفیسی وەکالەت:

(( کەسێک دێت و ئەیەوێ بچێتە ژوورەوە بۆلای تریفە.. دڵە بە پەلە هەڵئەسێت و ڕێی پێ ئەگرێ))

دڵە: فەرموو.

کەس: ئەچم بۆ لای خاوەنی ئێرە.

دڵە: خاوەنی ئێرەت بۆ چییە؟

کەس: ئیشی خۆم پێیەتی برا، مەسەلەی خواردن و خۆراکە.

دڵە: ئیشی من لێرە ئەوەیە کە ئەبێ بزانم ئیشەکەت چییە؟

کەس: ئەمەوێ بەشە خواردنی من بە جیا بێت و خۆم بیبەم، وەکیلەکەی لای خۆمانم بە دڵ نییە، دادپەروەر نییە.

دڵە(( دەست ئەگرێ بە دەمیەوەو پێ ئەکەنێ)): چی نییاااا؟؟؟؟؟ دادپەروەر؟؟؟؟؟؟؟ (( پێکەنینی کەم)) فەرموو فەرموو دوامکەوە.

(( ئەچنە ژوورەوە))

——— تابع ——————— Cut ———————

دیمەنی – ١٤٧١ – متبوع – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( دڵەو کابرا ئەچنە ژوورەوەو دوای سڵاو))

دڵە: دادە تریفە ئەم پیاوە هاتووە داوای دادپەروەریی ئەکا، هیچت لا دەست ئەکەوێ بیدەیتێ؟

کابرا: کاکە گاڵتەم پێ مەکە من وتم وەکیلەکەی لای ئێمە دادپەروەر نییە، خۆ دادپەروەریی بە کیلۆ نییە؟

دڵە: داوای لێبوردن ئەکەم ببورە کاکە گیان، بەڕاستی من هەر ناشزانم چییە؟ بەڵاوم ئەو ڕۆژە کۆمەڵێ خەڵک بەسەر جادەکەیا ئەڕۆشتن و داوایان ئەکرد، منیش هەر گرێ بوو لە دڵما، وتم تۆ بڵێی خۆمان لامان نەبێ یەکی تۆزێکیان بدەینێ و بچنەوە بۆ ماڵەوە؟

تریفە: باشە کاکە دڵە سوپاس، تۆ بچۆرەوە جێی خۆت.. فەرموو برا لە خزمەتتا بم، ئەمرکە.

کابرا: ڕاستییەکەی بۆ گلەوگازندە هاتبووم لە وەکیلەکەی لای خۆمان، کە بە باشیی خۆراکەکان دابەش ناکا.

تریفە: چۆن ئەفەرمووی با تیبگەم؟ لە چ بارەیەکەوە خراپە.

کابرا: هەر لێگەڕێ خوشکەکەم، ئەو کوڕەی چووە دەرەوە زۆر باشی تێگەیاندم.. هیچ گلەییم نەما.. (( بەدەم ڕۆشتنەوە)) ڕێزی ئەو کوڕە بگرن تکایە، باش لە دنیا حاڵیی بووە.

Cut

دیمەنی – ١٤٧٢ – ڕ / ن – کۆمپانیای تازە- ژووری تافان:

(( تافان جلوبەرگی نوێ و ڕێبوار.. کەمێکی دەرگاکە کراوەتەوە ))

تافان: هەر دوێنێ نیوەم کرد.. زۆر دڵمان خۆش بوو، ئای مناڵ چییان کرد چییانکرد؟

ڕێبوار: ئەک یاخوا بە خۆشیتان بێ و هەموو شتەکانیشتان پیرۆز بێ، بەم جلانەوە هەر بووی بە بووک!

تافان: ئەها، یەعنی خۆم ناشرینم جلەکان جوانیان کردووم؟

ڕێبوار: ئەهـ ماڵت ئاوا بێ بردتەوە بۆ کوێ؟ کەی من وام وتووە؟ ئەڵێم جوانتر بووی.. خۆ ئەگەر ئەم ئێوارەیەش کاتت هەبێ و پێکەوە بچینە دەرەوە، منیش ئەوەی بتەوێ بۆت ئەکرم.

تافان: جا بۆچی بۆ منی ئەکری بەقوربان؟ بۆ خۆتی بکرە، تۆش شتەکانت تازەکەوەرەو جلوبەرگیشت.

ڕێبوار: بەشی تۆشی تیایە، لەبەر ئەوەی گوناحیت.

ڕێبوار: ئەمە بۆ گوناح بووم لە پرێکا؟ بە پێچەوانەوە زۆر باشم.

ڕێبوار: هەفتەی داهاتوو باش نابیت، ئەکەویتە تەعزێوە!

تافان: تەعزێی چی زمانت بە برِینچێ؟

ڕێبوار: مێردەگوڵەکەت.

——— ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ١٤٧٣ – مربوط - ڕ / ن – بەردەرگای ژووری تافان:

(( هاوکار گوێی لە ڕێبوارو تافان گرتووە و ئەم دەنگە ئەبیستێ و ئەشڵەژێ))

تافان: بۆ؟ فرمانی بۆ دەرکرد؟

ڕێبوار: بەڵێ، پیاوکوژەکەشی ڕاسپارد، کەواتە حەفتەی داهاتوو ئەم کاتە تۆ بێوەژنی هەههههە.

تافان(( دەنگی تێکچوو)): نا، توخوا ڕایگرن.. دوێنێ زۆر بەزەییم پیا هاتەوە گوناحە، ئەزانی چی ئەکرد لەگەڵ ئەو منالانەیا؟ توخوا ڕایگرن.

ڕێبوار: وەڵا تازە مەگەر هەر کاک دیدەوان خۆی ڕایگرێ.. ئەی خۆت پێت نەوتووە ڕازییم؟ .. لە ئێستاوە هەر ڕاوچییەکە بۆی هەڵکەوێ ئەیپێکێ.. بە قسەشم ئەکەی لەگەڵیا مەڵێ، چونکە کاک دیدەوان ڕای لەسەرت ئەگۆڕێ، ئەو خەڵکی حولحولیی خۆش ناوێ.

تافان: چۆن؟ یەعنی تازە تیاچوو؟

ڕێبوار: تۆ خەمی چیتە بەساقە؟ ئیتر دەست و پێت باشتریش ئەکرێتەوە بۆ ئیش.

(( هاوکار بە پەلە ئەڕوات، پاش کەمێکیش ڕێبوار دێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٤٧٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی چاپخانەی تیرۆژ:

(( باهۆز لەگەڵ تیرۆژدا دانیشتووە))

تیرۆژ: جا کاک باهۆز ڕاستیەکەی ئەبێ ئێمە بیدەینە دیزاینەرەکە دیزاینی بکا، کە خۆت دیزاینت نەکردبێ.

باهۆز: ڕاستییەکەی ئەمەوێ جارێ بپرسم چەندی تێ ئەچێ و ئەوسا باسی وردەکارییەکەی بکەین.

تیرۆژ(( ئەینوسێت)): چەند لاپەڕەیەو بە چ قەبارەیەک ئەتەوێ.

باهۆز: ٢٥٠ لاپەڕەیە، لە نیو ئەی فۆر تۆزێ گەورەتر بێ بە باری درێژییا.

تیرۆژ: تۆ بڵێ ئەی فۆر.. پێوانەکەیم بدەرێ، زیاتر مەبەستم لەوە بوو بزانم، نیو ئەی فۆرە یان چۆن؟ ئەی هەر شیعرە وانا؟

باهۆز: سەرەتا لێکۆڵینەوەیەکەو ئەویتریشی شیعر.

تیرۆژ: مۆتیڤت ئەوێ لەگەڵ شیعرەکان؟

باهۆز: بەڵێ هەبێ جوانتر نییە؟

تیرۆژ: ئەوە خۆت ئەیزانی، وتت تیراژی چەند بێ؟

باهۆز: هەر عادەتیی وەک چاپی یەکەم ٥٠٠ دانە.

تیرۆژ: بەرگ سلیڤانی مات بێ یان زەق؟

باهۆز: خۆتان ڕووە هونەرییەکەی باشتر ئەزانن.

تیرۆژ: سلیڤانی مات جوانترە.. ئەیجۆری لاپەڕەکانی چۆن بێ؟ چەندین جۆری لێیە.

باهۆز: لاپەڕەیەک هەیە زەردی کاڵ و خاکیی و لەو بابەتانەیە، تەنک و جوانە..

تیرۆژ(( هەڵئەسێ هەندێ وەرەقەی نیشان ئەدا.))

تیرۆژ(( هەر بە پێوەیە)): یەک دەقە چاوەڕێم بکەی، ئێستا دێمەوە.

باهۆز: ئەگەر پێویستیت بە شتێکە با من بچم.

تیرۆژ: نا نرخت بۆ ئەهێنمەوە، ببورە.

Cut

دیمەنی – ١٤٧٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

((شەنیا دانیشتووەو قەلەقە، ساماڵ بە دڵخۆشیی و گورج دێتە ژوورەوە))

ساماڵ: دەی هەستە گوڵ.

شەنیا: بۆ کوێ؟ تۆ پێم بڵێ شێری یا ڕێوی؟

ساماڵ: بەشێریی هاتوومەوە گەر نەڕەمت بەدل بێ هەه هەستە لە ڕێگە بۆت باس ئەکەم.

شەنیا: ئاخر بۆ کوێ؟ خۆ پێت نەوتم.

ساماڵ: زۆر زۆرم برسییە، ئەچین بۆ چێشتخانە خۆشەکە.

شەنیا: من سەرودڵم گیراوە جارێ، هیچم بۆ ناخورێ.

ساماڵ: گرنگ ئەوەیە بەرامبەرم دانیشتبی.. تکایە زوو هەستە خۆم بۆ ناگیرێ، ئەلەرزم.

(( شەنیا هەڵئەسێت و بەرەو دەرەوە ئەچن))

Cut

دیمەنی – ١٤٧٦ – ڕ/ن – کۆمپانیای تازە – بەرچایخانەکەی هاوکار:

(( هاوکارو خدر پێکەوە وەستاون))

هاوکار: بەم دوو گوێیەی خۆم گوێم لێ بوو.

خدر: تافان پێی خۆش بوو؟

هاوکار: نا ئەیوت لێیگەڕێن، بەڵام کابرا ئەیوت خۆت ڕەزامەند بووی لەسەری.

خدر: چ بەڵایەکە ئەم ژنە؟ ئەی هاوار!!! باشە هیچ خۆت تێکمەدە ئاسایی بە.

هاوکار: بەسەرچاو قوربان.

(( خدر ئەڕوات و هاوکاریش بۆ چاخانەکەی))

Cut

دیمەنی – ١٤٧٧ – ڕ/ن – چێشتخانە:

(( شەنیاو ساماڵ دانیشتوون))

ساماڵ: ئەی کە پێت ئەڵێم خەمت نەبێ، هەڵبەت لە خۆم ڕائەبینم.. ئەمشەو سەعات سێ ی شەو خۆشت ئامادەبە.. نیوەی ئەبرێت و هەر لە بەیانییەوە ئیتر ناوبەناو لێی ئەبرێتە دەرەوە.

شەنیا: سامال، ئەوانە کێن ئەیبەن؟

سامال: متمانەی منیان پێ بکە بێ خەم بە.

شەنیا: ئەی ئەگەر چاویان چووە سەر پارەکەو تەماعیان تێکرد؟

سامال: جا مەگەر من مردبم.

شەنیا: ئەو پارەیە هی ئەوەیە پەنجای لەسەر بکوژرێ، چۆن ئاوا بە ئاسانیی ئەیخەیتە بەردەستی خەڵکی نەناس؟

سامال: نەبابە نەناسی چی، هەموو لە ئێسک و خوێنی خۆمن.

شەنیا: شوێنەکەت پێ وتوون؟

سامال: نا.. تا نەگەینە ئەوەی باریکەن، چۆن شوێن ئەڵێم.

شەنیا: دە ئەوە ڕاگرە چاوەکەم.. من شتی وا ناکەم.

سامال: ئەی چۆن ببرێتە دەرەوە؟

شەنیا: من هەر جارەو بەشێک لەو پارەیە دەرئەهێنم و ئەیبەمە ماڵی خۆم یان ماڵی تۆ.. با لەوێوە ببرێ.. ناکرێ نا، خەڵک ئەو شوێنە بزانێ.

سامال: جا بەوجۆرە هەزار کاروانی ئەوێ.

شەنیا: یاڵڵای ئەکرد دە هەزار کاروانیش، لەوە باشترە خەڵک بیباو لەسەریشی بکوژرێین.

ساماڵ: ڕاستە، تۆ زۆر وریاتری، باش نەبوو شوێنەکەشم پێ نەوتن!

شەنیا: وتنی شوێنەکە زۆر دڵنیابە واتە هەڵکەندنی چاڵی گۆڕی هەردووکمان.

ساماڵ: کەواتە پێیان بڵێم بارکردنەکە دواخرا بۆ سبەی شەو.

شەنیا: خراپە، کات مەڵێ، هەر بڵێ دواخراوەو تەواو، تۆ بۆ ئەوەندە داماوی؟

سەرچڵ(( مۆبایل دەرئەهێنێ)): باشە با پێیان بڵێم.

Cut

دیمەنی – ١٤٧٨ – ڕ/ د – سەرشەقامی گشتیی:

Mute

(( یەکگرتنی هێزەکەی ئاسایش و پۆلیس لەسەر شەقامێکی گشتیی.. ڕاهۆزو بەهێزو ئاری دائەبەزن و هەندێک قسە پێکەوە ئەکەن و دەرئەچن))

Cut

دیمەنی – ١٤٧٩ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە بە تەنیا دانیشتووەو پاش کەمێک هەندرێن دێت و دوای سڵاوێکی ئاسایی))

تریفە: کاک هەندرێن، کاک حەمەخدر تەلەفونی کرد، وتی بە هیچ لایەکا نەچێ، ئیشێکی زۆر پێویستم پێیەتی، لەوێ بێ تا خۆم دێمەوە.

هەندرێن: بەسەرچاو تریفە خان.. نەیوت چییە؟

تریفە: نەوەڵا هەر ئەوەندەی وت و منیش وتم ئێستا پێی ئەڵێم، دیار بوو ئیشەکەی زۆر گرنگە، وتی هەر مۆبایلەکەت داختەوە بە پەلە یەکێکی بۆ بنێرە.. خۆشم هاکا پەیا بووم.

هەندرێن: هەر ئەمرێکی هەبێ ئەیخەمە سەر سەروچاوم.. بەڵام بەخوا تریفە خان چی بێ لە تۆ نهێنیی.. ئەم ماوەیە هەست بەشتی زۆر سەیر ئەکەم.

تریفە: شتی وەکو چی کاک هەندرێن، دڵەڕاوکێ نەتگرێ، هەڵبەت ئیشی وەکالەتەکەیە.

هەندرێن: نا مەبەستم خودی ئەم داوایەی کاک حەمەخدر نییە.. نازانم هەستێکی ناوەکیم هەیە، وەک جاران ناگوزەرێ.

تریفە: چی وەک جاران ناگوزەرێ کاک هەندرێن؟ ئەگەر مەبەستت ئیشی ئێرەیە، بەخوا هەروەکو خۆیەتی و تۆش بەردەوام هەر برای بەڕێزی هەمووماني.

هەندرێن: شتەکانی ناوەوەی خۆت ناتوانی پشتیان پێ ببەستی.. بەڵام ئیتر مرۆڤیش بەو وەهمانەوە جوانە، وانییە؟

تریفە: بەخوا تەقەی سەرم دێت، هیچ تێناگەم ببورە کاک هەندرێن هەە ئەوەندەی بزانم.. هەموو شتەکان لە جێی خۆیانن.

هەندرێن: دەی زۆر سوپاس.. ئەوە لە شوێنی خۆمم، هەرچەند نیازی ئەوەم بوو سەرێکی تافان بدەم، بەڵام لێی ئەگەڕێم تا کاک حەمەخدر دێتەوە ـــــ Cut ـــــــ

دیمەنی – ١٤٨٠ – ڕ / د – بەردەمی کارگەی نیگار:

Mute

(( هێزەکەی ئاسایش و پۆلیس بە خێرایی و لوورەوە، ئەگەنە بەردەمی کارگەکەی نیگارو بەهێزو ڕاهۆزو چەند پۆلیسێکی کەم ئەچنە ژوورەوە.. لەولاترەوە شەنیاو سامالً بە سەیارەکەی شەنیا دەرئەکەون))

———— ربط ———— Cut ————

دیمەنی – ١٤٨١ – ڕ/ د – بەرکارگەی نیگار – ناو سەیارەی شەنیا:

(( شەنیاو سامالٚ ئەگەنەوە بەر کارگەو هێزەکەی پۆلیس و ئاسایش ئەبینن ئەچنە ژوورەوە ))

شەنیا: ئەو هەموو هێزە چییە سامالٚ؟ تۆ نەتهێنابن؟

سامالٚ: ئەوە بەڕاستتە؟ من برژانگێکی تۆ ناگۆڕمەوە بە هەموو دنیا، ئەم قسەیە چی بوو شەنیا؟ قەت ئەوەم لێ ڕانەئەبینیت وا بلٚێی؟

شەنیا: کورە شێت بووم، ئەو پارەیە بدۆزنەوە، خۆ من ڕێک ئەمرم(( دەرگا ئەکاتەوە دابەزێ)) ئەچم بزانم چییە؟

سامالٚ(( دەستی ئەگرێ)): دانیشە شەنیا نەچی، بۆ پارەکە هاتبن خۆشت تیا ئەچی!

شەنیا(( ئیهمالی ئەکاو بە تووڕەیی خۆی ڕائەپسکێنێ و بە ڕاکردن ئەچێت بۆ کارگە))

_____ تابع _____ Cut _____

دیمەنی – ١٤٨٢ – متبوع – ڕ / ن – ناو کارگەی نیگار:

(( پۆلیس و ئاسایش لە ژوورەوەن و شەنیا بە خێرایی بەرەو ڕوویان ڕائەکات))

شەنیا: فەرموون فەرموون با بچینە سەرەوە، فەرموون.

بەهێز: تۆ لێرەیت؟

شەنیا(( خەندەو هەناسەسوار)): بەڵێ قوربان، نیگار خان خاوەنی ئێرەیە، ئەو بە هۆی ڕووداوی هاتوچۆوە لە جێدایە، من ئێرە بەڕێوە ئەبەم.

بەهێز(( کاغەزێک دەرئەهێنێ)): ئەوە فەرمانی دادوەرە بە پشکنینی ئێرەو هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە کاک ڕەمزییەوە هەیە، کە پێشتر ئێرەی بەڕێوەبردووەو ئێستا کوژراوە.

شەنیا(( غەمبار)): خوا عافویکا، بەڵێ، کەس نەیزانی چ نامەردێک ساردی کردەوە، بەداخەوە.. دە فەرموون لەسەرەوە هەموو ئەو ئیشانەشتان بخەمە بەردەست کە کاکە ڕەمزی ئەیکرد.

ڕاهۆز: زۆر غەمباری بۆی، پێتەوە دیارە.

شەنیا: ڕێک وەک کاکم وابوو.

بەهێز: تۆ ناوت چییە؟

شەنیا: شەنیا.

بەهێز(( بۆ ڕاهۆز)): فەرموون با بچینە سەرەوە (( بۆ پۆلیس)) ئێوە کارگەکە بپشکنن، هەرچییەکی نائاساییتان بینی، لەگەڵ دەستانا بیهێنن.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٤٨٣ – ڕ / د – بەردەمی کارگە- سەیارەی شەنیا:

(( ساماڵ تێل ئەکا..))

ساماڵ: بەڵێ بەڵێ ئاسایش و پۆلیسی دنیا ڕژاونەتە ئەو ناوە، شەنیاش ڕایکرد بۆ لایان.......... بەڵێ بەڵێ منیش ئەچم، بزانم بۆ چی هاتوون.

(( مۆبایل هەڵئەگرێتەوە))

<u>**ساماڵ مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە**</u>:

ساماڵ: با بچم، خۆ دوایی هەمووی بەسەر منا ئەهێنێ و ئابڕوم ئەباو کورە ڕەنگە بە کوشتیشم بدا.

Cut

دیمەنی – ١٤٨٤ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو هەندرێن))

خدر: چۆن شتی وا ئەبێ؟

هەندرێن: ئاخر دوێنێ پارەیەکی مۆڵی هێنابووەوە، ئەیوت دۆزیومەتەوەو بە پای پیلان خەرجی کرد.. من سوور ئەزانم ئەو پارەیەی بەرامبەر بە شتێک دراوەتێ و دۆزراوە نەبوو، پێم باش بوو بە شێنەیی چاودێریی بکەم و شتێکم بۆ دەربکەوێ.

خدر: شتەکان لە خۆت ئاڵۆز مەکە هەندرێن گیان.. ئەو هەواڵەی بیستوومە، هیچ پەیوەندیی بە خێزانەکەتەوە نییەو هیچ دەماغسزێک نییە، بە هیچ ژنێک بڵێ لەم ڕۆژانەیا مێردەکەت ئەکوژین؟..

هەندرێن: ماڵی باوکی تۆ لە ماڵی باوکی خۆم فەرزترە کاک حەمەخدر، لاریم نییەو سوپاسیشت ئەکەم ئەمنێریتە ئەوێ.. بەڵام ماڵە خزمیش زۆرن بچمە لای یەکێکیان، دڵنیابە دالدەم ئەدەن.

خدر: هیچ شوێنێک لە ماڵی باوکم ئەمینترو بێ منەتتر نییە برا.. خەڵکیشیان لەبەردەستایەو ئیشکەریش هەیە.. لە خۆتی تێک مەدە.. هەر لە دەرەوە ببینرێی ئەتکوژن.. دەستوبردکەو بچۆ هەندێ جلوجۆڕ لە ماڵەوە کۆکەرەوەو بە تەلەفونیش بە ژنەکەت بڵێ حەمەخدر ناردوومی بۆ سەفەرێک، چەند ڕۆژێکم پێ ئەچێ، ڕەنگە بشمنێرێ بۆ دەرەوەی وڵات.

هەندرێن: ئەی ناڵێ بۆچی؟

خدر: بڵێ ڕێککەوتنی گەورەی کردووەو خۆی نایپەرژێ بچێ.

هەندرێن: ئەی مناڵەکان؟

خدر: هیچیان بۆ نابێ و خۆشم سوکە ئاگایەکم لێیان ئەبێ.

(( نارەوەن بە هەڵەداوان دێتە ژوورەوە))

نارەوەن: ئەوە لێرەی حەمەخدر گیان؟

خدر(( خەندە)): خێر ئەوە بۆوا بە هەڵەداوان؟

نارەوەن: زۆر پیس قەوماوە.

خدر(( کەمێک سەرسامیی)): لە کوێ؟

نارەوەن: دیدەوان هەموو شتەکانی خۆی لە کۆمپانیا کۆکردەوەو کلیلی لە منیش وەرگرتەوەو وتی بە حەمەخدریش بڵێ، کەستان نەیەنەوە بەم دەوروبەرەیا.. تۆ بڵێی چی ڕوویدابێ؟

خدر: هیچ نییە، دوایی خۆی تێمان ئەگەیەنێ.

نارەوەن: ئا وتی تەلەفونیشم بۆ نەکا، تا خۆم بۆی ئەکەم.

خدر: ئێ باش!! هەندرێن تۆ بڕۆ کاکە، هیچ دوانەکەوی.. جلەکانت بێنەو وەرەوە، لێرەوە کەسێک دێت بە دواتاو ئەتبا.

نارەوەن: بۆ کوێ؟

خدر: ئیشێکی تایبەتە، پەیوەندیی بە تۆوە نییە.

هەندرێن: ئەی کێ ئەچێتە جێگەکەم، بەخوا خەمی ئێرەشمە.

خدر: تۆ خێرا بڕۆ.. خەمی کەست نەبێ هی خۆت نەبێ.

هەندرێن: باشە کەواتە من خواحافیز(( ڕۆشتن و خواحافیزیی))

نارەوەن: ئەوە چییە هیچم پێ ناڵێی؟ سوور ئەشزانم هەمووی لەژێر سەری تۆدایە.

خدر: چییە؟ لەبەرچاوی هەندرێن پێت بڵێم چی ڕوویداوە؟

Cut

دیمەنی – ١٤٨٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی نیگار:

(( شەنیا دانیشتووەو ساماڵ بە پێوە.. بەهێزو ڕاهۆزو ئاریش هەر بە پێوەن))

ڕاهۆز(( بۆ ساماڵ)): تۆ چی ئەمیت؟

ساماڵ: مارەبڕمە، بەڵام نەمگواستۆتەوە.

ڕاهۆز: هی منالییە؟

ساماڵ: نەخێر قوربان گیان دوێنێ مارەبڕینمان تەواوکرد.

ڕاهۆز: تۆ جارێ بچۆ دەرەوە، بەڵام یەک شت.. چی لەبارەی ئەو پارە زۆرەوە ئەزانی.

ساماڵ: هیچ شتێک گەورەم، هەر تووشی شۆک بووین، منیش و شەنیاش.

ڕاهۆز: دەی باشە.. جارێ لە دەرەوە بە.

بەهێز: مولازم ئاری تۆ بچۆ بزانە هەر کرێکارێک ئاگادارە، قسەی وەرگرە.. بۆکسەکان گەیشتن؟

ئاری: بەڕێوەن گەورەم.

بەهێز: بە پاسەوانییەوە بیبەن بۆ بانکی ناوەندیی و بە ئامانات داینێن، تا دادوەر بڕیار ئەدا.

ڕاهۆز: شەنیا خان، ئەی هیچ جوڵەیەکی نیگار خان یان کاک ڕەمزیت هەست پێ نەکردووە بەرەو ئەو دیوارە، کەمێک سەرنج ڕاکێش بووبێ؟

شەنیا: بە هیچ جۆرێک گەورەم، خۆ شتێکی وام بزانیایە شتێکم هەر لێدەرئەهێنا بۆ خۆم، با ڕاست بڵێم.

ڕاهۆز: وتت ئێستا نیگار خان کەڵکی هاتنە دەرەوەی نییە؟

شەنیا: نەخێر قوربان، چوارپەلی شکاوە.

ڕهۆز: کێشە نییە، خۆمان ئەچینە خزمەتی.

شەنیا: حەز ئەکەن منیش لەگەڵتانا دێم.

ڕاهۆز: تۆ هەر ئەبێ بێیت خانم گیان، ئەگەر نیگارخانیش نەبێ.

شەنیا: جا من بۆ بێم؟ خۆ کارگەی من نییە.. من هەمووی ماوەیەکە هاتوومە ئێرەو سێ چوار ڕۆژ نابێ بەڕێوەی ئەبەم.. ئاگام لە چی بێ؟

ڕاهۆز: نا خانم ببورە، بە هیچ تۆمەتبارت ناکەین.. بەڵام بەو پێیەی لە ئێستادا جەنابت ئێرە بەڕێوە ئەبەی، هەر ئەبێ لای دادوەری لێکۆڵینەوە وتەت تۆمار بکرێ.

Cut

دیمەنی – ١٤٨٦ – ڕ / ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان و باڵا لە ماڵەوەن، تازە تافان لە ژوورێکەوە دێتە دەرەوەو جلەکانی ماڵەوەی ڕێک ئەخات کە تازە خۆی گۆڕیوە.. هەندرێن خۆی دەرگا ئەکاتەوەو دێتە ژوورەوە))

هەندرێن: ئەوە چۆنە لە ماڵیت؟

تافان: ئەی تۆ خێر وا زوو هاتیەوە، خۆ ئێوەش داتاننەخستووە؟

هەندرێن: نا گیان.. زانیم ئێوە داتانخستووە، نارەوەن خانیشی ناردۆتەوە خاوەن کۆمپانیاکەتان.

تافان: نازانم چی ڕوویدا، هەر هەمووی ئیزندا، تەنانەت نەیهێشت چایچییەکە چاکەشی بڕێژێ.. ئەی تۆ؟

هەندرێن: منیش کاک حەمەخدر بە پەلە ئەمنێرێ بۆ قەزایەک نازانم کوێیە، کڕیاری تازەیان پەیا کردووە، وتی سەفەرێکی دەرەوەی وڵاتیش هەیە ڕەنگە هەر لەوێوە بتنێرم.

تافان: هەر زۆر باشە بڕۆ بەساقەوبم (( هەندرێن هەڵوێستەیەک ئەکا)) هەر چەندت پێ ئەچێ خەمی ئێرەت نەبێ، وا ئیتر خۆشم لە ماڵەوەم ئاگام لە مناڵەکانیش ئەبێ.

هەندرێن: قەت وا نەبووی تافان، بچم بە لایەکاو نەیکەی بە هەرا.. خێر وا زۆرت پێخۆشە؟

تافان(( کەمێک شڵەژان)): نەوەڵا هەر بە ڕاست زۆر ماندووی حەز ئەکەم بچی جەوێک بگۆڕی.. ئەی قابیلە چی بێ؟

باڵا: توخوا باوکە زۆرت پێ نەچێ، ئەی شەوان لەگەڵ کێ یاری بکەین؟

تافان: باڵا گیان تا دێتەوە خۆم یاریتان لەگەڵا ئەکەم.

باڵا: بلێ بەڵێن بێ!

تافان: بەڵێن بێ.

هەندرێن: گۆڕانکارییت زۆرە تافان، ئەڵێی وا ئەزانی ناگەڕێمەوە.

تافان: ئەک یاخوا ڕاست نەبیتەوەو بەر گوللەی وێڵکەوی، چۆن دڵت دێ وا بڵێی؟

هەندرێن: ئەی نازانم.. زۆرت پێخۆشە ئەڕۆم و یاری لەگەڵ مناڵ ئەکەیت و زۆر نەرمیش بوویت.. قەت وا نەمبینیوی.

تافان: بەخوا هەر خۆشەویستییە، حەز ئەکەم دنیا بە دڵی خۆت بگوزەرێ.. تۆ بڵێی شتێک شک ببەم و پێت نەڵێم؟

هەندرێن: دەی باشە ئەو جلانە با کۆکەینەوە کە پێویستم ئەبێ، درەنگە.

(( هەر سێکیان ئەچنە ژووری نوستن))

Cut

دیمەنی – ١٤٨٧ – ڕ/ن – ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

(( عارف و گوڵزارو دیدەوان و سەرچڵ و ڕەوەزو زاهید ))

عارف: ئەوە چیتانە ئەو هەموو هەرایە.. بوەستن بزانین ساغی ئەکاتەوە بەسەر خۆیا یان نا؟ دەی خۆ ئەویش مناڵ نییە؟

ڕەوەز: من لەوە ئەترسم بتۆقیٚ و ناوی هەمووومان بدا، کاکە ئیٚوە نازانن ئاسایش چۆنە؟ هەر بڵیٚ ناوت چییە؟ لە خۆتەوە دان بە هەموو شتیٚکا ئەنیٚیت و هەرکەسیٚکیشت لەگەڵا بیٚ ناوی ئەڵیٚی. (( دیدەوان ڕائەمیٚنیٚ ))

# (( ئەڵقەی حەفتاو یەک ))

سەرچڵ: باوەڕ ناکەم شەنیا وابیٚ، لەتوپەتیشی بکەن هیچ ناڵیٚ.

گوڵزار: خۆزگە من بوومایە، من هەر گویٚ نادەمە ئازار، باوک و برا ئەوەندەیان تیٚ هەڵداوم، خۆشە بووم.

ڕەوەز: ئەی کاک دیدەوان تۆ ڕات چییە؟ لەوساوە تاس بردووتیەوە هیچ ناڵیٚی!

زاهید: من بزانم کاک دیدەوان بیر لە دوای هاتنەوەی شەنیا ئەکاتەوە.

عارف: پیٚویست بە وتن ناکا.. هەرچی بڵیٚین بیٚسوودە، تەنها چاوەڕوان بن و هیچیتر.

دیدەوان: ئەوە قسەی پیاوە! ئەوەی گرنگە ئیٚستا هەمووان خۆی لە بەرچاو ونکاو بڵاوەی لیٚ بکەن، تا خۆم تەلەفونتان بۆ ئەکەمەوە.

زاهید: بەڵام ئەو تافان و کچەکەی تریش ئەناسیٚ!

دیدەوان: منیش ئەو دووەم بۆ قوربانیی جیٚهیٚشتووە زاهید گیان.. ئەگەر گیران، یان نەگیران، ئەوسا قەبارەی مەترسییەکە ئەزانین و دەرئەکەویٚ ناوی وتبیٚ یان نا؟

(( شەنیاو ساماڵ دیٚنە ژوورەوە ))

شەنیا: سڵاااو (( ئامازەی سامال ئەکا)): ئەمەش پاڵەوانی فیلمی داهاتوومان، بەڕێز کاک سامالی مافیای گەورە.!

ـــــــــــــــــــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــ Cut ــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٤٨٨ – ڕ / ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین ))

سەرکۆ: پارەکە بەهەدەر نەچووەو نەکەوتە دەستی ئەم و ئەو.. تا ئێستاش بەڵگەی یەکلاکەرەوەمان لانییە.. گرنگ ئەوەیە سەرچاوەکەیان وشک بوو.

کۆژین: لەو بڕوایەدای کۆڵ بدەن؟

سەرکۆ: بە هیچ جۆرێک.. لەو باوەڕەدام ماوەیەک بزر ئەبن و دوای ئەوە کە ئەزانن چاودێرییان لەسەر نییە، لە سەرەتاوە تێهەڵئەچنەوە.. باوەڕ مەکە وابزانن بە دیاریانەوەین.

کۆژین: مانگ، خۆیان ئەشارنەوە؟

سەرکۆ: کەمتر.. ئێستا ئێمە لەناو دڵیانداین.. بەهۆی خدرەوە ئاگامان لە هەموو وردەکارییەک ئەبێت.

کۆژین: من لەو بڕوایەدام گومان لەو و لە نارەوەنیش بکرێ و دووریان بخەنەوە.

سەرکۆ: ڕێک بە پێچەوانەوە، خدر بەهیچ جۆرێک ئاگاداری ئەو پارەیەو شوێنی شاردنەوەی نەبووە لە دیدی ئەوانا، تا گومانی لێ بکرێ، هەروەها نارەوەنیش.. من وای ئەبینم، ئەمجارەیان هەموو قورساییەکە بخرێتە سەر ئەو دووانەو ئیشەکە بەوان بکەن..

کۆژین: ئەی بۆ پێش ئەوەی هیچ ڕووبدا، نەگیرێن و کۆتاییان پێ نەهێنرێ؟

سەرکۆ: لەبەرئەوەی ناکرێ خۆمان کاراسانییان بۆ بکەین.. بۆیە ئەبێت بە بەڵگەوە خۆیانی پێوە بگیرێن.. ئێستا هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆ نییە لەسەر هەموویان، کە سزاکەیان بارتەقا بکاتەوە بە تاوانەکانیان.

کۆژین: جا چۆن ئەوە ئەکەن؟ کە وەک ئەڵێی ئیش بەو دووە بکرێ.

سەرکۆ(( سەر ئەهێنێتە پێشەوە بۆ کۆژین)) ئەی خۆ ئێمە لێرە بۆ تەماشاکردن دانەنیشتووین ڕائید کۆژین؟ هەڵبەت ئێمە دانەڕۆکەیان بۆ ئامادە ئەکەین و ئەوانیش مل ئەنێن بە داوەکەوە.

کۆژین: گەورەم پێم باشترە مادام هەموو کەسەکان ناسراون و ئەشزانین لە کوێن ڕێگیریان لێ بکەین، نەک بواریان بدەین دەست پێ بکەنەوە.

سەرکۆ: بەڵگەیەکم بدەرێ.

کۆژین: چۆن ئەو هەموو پارەیە، کە سەرچاوەکانمان ئەزانن هی ئەوانە.

سەرکۆ: نکوڵیی لێ ئەکەن و لە باشترین حاڵەتدا بەسەر نیگارو ڕەمزیدا ئەهێنرێ.

کۆژین: گەورەم یەکێکیان بگیرێ، چوار شەقی تێهەڵدرێ، هەموو شتێک ئەڵێ.

سەرکۆ: هەهە زۆر گەرم بووی ڕائید کۆژین.. لێدان قەدەغەیە.. تۆ کەی وابوویت؟

کۆژین: شێوازی لێکۆڵینەوە زۆرە.

سەرکۆ: کاکە تۆش باش ئەزانی لێدان و فێڵ لێکردن و کاریگەریی مادەی هۆشبەرو بەڵێن پێدانی ناڕاست  قەدەغەن.. ئەگەر دانیش بە تاوانیانیا بنێن بە هەر شێوازێکیتر بێ، خۆیان لە سزا ڕاستەقینەکە ئەدزنەوە.. وا شەنیا هەیەو بە ناونیشانی ماڵ و شوێنی ئیش ئازاد کراوە، بانگی ئەکەینەوە بۆ لێکۆڵینەوە.. نیگاریشمان هەیە.. لە لێکۆڵینەوە ناوەستین، بەڵام گرتنیان بە بەڵگەوە هیچ دەرفەتێکیتریان بۆ ناهێڵێتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٤٨٩ – ڕ / ن – ماڵی باوکی خدر:

(( باوک و هەرمێ و غەمگین و هەندرێن ))

باوک: یاخوا بەخێربێی کوڕم بۆ ئەم سجنە زەریفە.. ئەوە تۆ چەندی تیا ئەبی؟

(( پێکەنین ))

هەندرێن: وەڵا چیت عەرزکەم مامە گیان؟.. دڵنیام دوو هەفتە کەمتر نییە!

باوک: کوڕم تۆ سجنی حمەخدری کوڕمت نەبینیوە.. ئەها کاتی بەعس ئەیانوت یەک دەقە ئیشمان بە کوڕەکەت هەیەو ئیتر نەیانئەبینییەوە؟ ڕێک ئاوایە.. دوو هەفتەکەی تۆ با دڵنیاتکەمەوە، دوو مانگ کەمتر نییە.

هەندرێن: ئەڵێی زۆر بێزاری لێرە مامە گیان؟ بەڵام بۆ پاراستنی ئێمەیە.

باوک: هەر لێرە بێزار نیم، لەوەتای هێناوینیەتە شارەوە، ئاوا کۆت و پێوەندی کردووین.. کورە من لە کوێ و شاری نەعلەتیی لە کوێ؟ لەوێ من و دار بووین، من و هەردو نشێو، من ڕوبار، من و بێستان، جا من و چی نەبووین کوڕم؟ وا لێرەش لە بەیانییەوە خوا ڕۆژ ئەکاتەوە بەرامبەری یەک دەم بە قوتەوە ئەگرین، باسێکمان نەماوە بیست جارمان نەوتبێتەوە.

هەرمێ(( پێکەنین )): هەرچی بۆ یەکتر باس ئەکەین، ئەویتر ئەڵێ ئەوە ئەخیرەکەیەتی، تەواوی مەکە.

غەمگین: ئاسایی وەریگرە کاکە، ماوەیەکیتر باسەکانی تۆش وای لێدێت.

(( پێکەنین ))

باوک: ئەڵێم.. بۆ دەست پێ ناکەی، باسەکانی تۆمان نەبیستووە، با شتێکی تازەمان گوێ لێ بێ.

هەندرێن: نا نا.. من وەکو ئێوە ناکەم، دەستی پێوە بگرم باشترە. (( پێکەنین ))

Cut

دیمەنی – ١٤٩٠ – ڕ/د – ناو سەیارەی شەنیا – سەر شەقام:

(( سامالّ و شەنیا ))

شەنیا: خۆ تازە پارەکە برا.. ئەوانیش خەمی پارەکەیان بوو.

سامالّ: ئەوەندەی من بزانم ئەوان تۆیان مەبەستە لەسەر قسەی خۆت ئەوە ئەلّێم و ئەو ڕۆژەش هەستم پێکرد، ئەگینا خۆ باش نایانناسم.. بەلاّم ئەوە بوو داوای ئیشە گەورەکەیان ئەکردو منیش ڕێ و شوێنی باشم بۆ داناوە، بێخەمبە.

شەنیا: یەعنی هیچت پێ ئەکرێ؟

سامالّ: نا ئاقلّ گیان، تا بکوژی جوانەمەرگی برام ئەدۆزمەوە، بەدەمەوە ئەیانگرم و کە تۆلّەی خۆشم کردەوە، ئەوسا مەگەر بە خەو بمبیننەوە.. بۆیە حەز ئەکەم کەمێ تێکەلیان بم.

شەنیا: جارێ وا هەست ئەکەم کێشەیان نەبێ لەگەلّما، بە دەم و دوویانا دیارە.

سامالّ: باوەڕ ناکەم قەت کێشەشت بۆ دروست بکەن.

شەنیا: ئینجا وا دروستیشیان کرد، من تازە فێری ئیشەکان بووم، خۆمان ئەیکەین و پێویستیم بەوان هەر نییە، بە هیچ کەسێکیان.

سامالّ: زۆر باشە، کەواتە با بڕۆین.

شەنیا: یەلّلا دەی هەرچی ئەبێ با ببێ، باوەڕ ناکەم هیچیش ببێ، با بچین و تۆش وەک مافیا گەورەکە فەرمانە سەرەتاییەکانی خۆت دەرکە.

Cut

دیمەنی – ١٤٩١ – ڕ / ن – ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و نیناو سۆماو دیارو ئاوا.. نانخواردن))

سۆما: ڕۆشت ماڵی باوکی بگەیەنێتەوە.

ئاوا: کوڕێکی باشە، خۆشم ئەوێ.. ئەوە چەند جارێکە ئەیبینم زۆر بێدەنگە.

سۆما: سوپاست ئەکەم، وەڵا هەروایە، پرسیاری لێ نەکەی قسە ناکا.

ئاوا: ئەی بۆ هێشتتان ماڵی باوکی بڕۆن؟ خۆ چی زۆرە نان زۆرە خەسار ئەبێ.

نینا: زۆریشم لێکردن، بەس هەندێ کەس حەز بە نانی تەعزێ ناکەن. ڕەنگە لەوجۆرە بن.

گێلاس: کچم ئەوە بۆ ماڵێک ئەبێ مناڵیان ورد بێ، بەخوا ئاکۆ گیان (( ئەگری)) ئەوەندەی جێهێشتووە، کە سەد ساڵ لێی بخورێ کەم نەکا.. وەی قوربانی ئەو خۆڵەش بم پێی داپۆشرای.

دیار(( گرژ)): دە تواخوا دەست پێمەکەرەوە، بهێڵە نانەکە بخۆین.

گێلاس(( بە گریانەوە)): بەخوا من کوشتم.. ئەگەر نەمناردایە ئەو تەلارە دروستکا بۆ جەڵتە لێی ئەدا.. وەی قوربانت بم ئاکۆ گیان.

دیار(( کەوچکەکە فڕێ ئەدا)): ئەوە شینی دابەستەوەو نانەکەی لێکردینەوە بە قوزەڵقورت.. ها، هەمووی خۆت بیخۆ (( ئەڕوا))

گێلاس(( بەدەم لوشکە لوشکەوە)): ئەئاوا شێتە خۆ ئەیبینن.. بەخوا ئیتر چاوی باوکی لێ دیار نەما، خوا ڕەحم بە من بکا!

ئاوا: نا گێلاس خان گەنجەو هەروا ئەبێ، تۆ گەنجیترت نەبینیوە، وەڵا من زۆر لە دیار ڕازیم، زۆر بە ئەدەبە.. دە تۆش لەسەر سفرەکە خۆت بگرەو مەگری، چی ئەبێ؟

گێلاس: خۆم بۆ ناگیرێ ئاوا گیان، خۆ بەدەست خۆم نییە.. شەڵڵا پیاوێکی خراپ بووایەو دوعا دوعام بووایە زوو بمرێ. ———— Cut ————

دیمەنی – ١٤٩٢ –گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٤٨٨ –ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و سەرچڵ و عارف و ڕەوەزو شەنیاو گوڵزارو ساماڵ))

دیدەوان(( تورە)): تۆ ئەو شوێنەت بۆ زووتر بۆ ئاشکرا نەکردین هەی چاوچنۆک؟

شەنیا: ئەوە چییە کاک دیدەوان؟ لەبری ڕزگار بوونم لە دەستی ئەو هۆردووە پۆلیس و سەربازە، وامزانی دێیت و باوەشم پیاکەی، کەچی قسەم پێ ئەڵێی؟ ئەگەر بمزانیایە لەوێیە، چۆن ئەمهێشت بکەوێتە دەستی ئەوان؟

دیدەوان: قوزەڵقورت!! بەسیەتی درۆ.. تۆ بە نیازی دەرکردنیشی بووی بۆ وڵاتیتر.. درۆو دەلەسەیترم ناوێ، وەک سەگ پەتت ئەکەم بە عەزابەوە ئەتکوژم.. تۆ بووی بە مایەی ڕەنج بەخەسار بوونی دەیان ساڵەی هەموومان.. هەی بۆگەنی کچی نیزامە کەر.

شەنیا(( دەست بۆ دەمانچەکەی ئەبات و دەری ئەهێنێ)): بە باوکم نەڵێی کەر!! (( ساماڵ کە لە تەنیشتیەوە وەستاوە، پەلاماری دەستی ئەداو لێی ئەسێنێ)) ساماڵ!!!!! لێمگەڕێ، قسە بە باوکم ئەڵێ، چۆن قبوڵی ئەکەی؟

(( پێکەنینی دیدەوان))

ساماڵ(( پاڵێکی پێوە ئەنێت و فڕێی ئەداتە سەر قەنەفەیەک)): تۆ ناپاکیی لەم هەمووە بکەی چۆن لە منی ناکەی؟ هەی بۆگەن.

شەنیا: ساماڵ تۆ ڕوح و گیانم بووی، تکایە با باوەڕ بکەم، بڵێ بە گاڵتە وا ئەکەم، سوعبەتە.

ساماڵ: وەڵا بەسەری ئەو باوکە کەرەت زۆر بەڕاستمەو هەردوو چاویشت دەردێنم.

شەنیا: هاوسەرە ئازیزەکەت؟

دیدەوان: ئەم گروپە هەمووی وەک خۆت وایە سەگسار! نە هاوسەرگیریی تیایەو نە خۆشەویستی و نە قسەی قۆڕو نە مانەوەی تاسەریش، وەک خۆت هەمووی خەریکی بەرژەوەندیی خۆیەتی.. بەرژەوەندیی ساماڵیش ئێستا لەگەڵ ئێمەدایە.

ڕەوەز: من ئێستا با بزانم، تۆ ئەم مافیا گەورەیەت ناردبوو بۆ شەنیا؟

دیدەوان: مافیای گەورەی چی؟ خۆم ئەو خانووە دوورە دەستەشم دابوویە بۆ خۆ شاردنەوە لە ڕەمزی هاهاها.

سەرچڵ: کەواتە ئاگاداری ئەوەش بوویت دڵنیا شوێنی ئەکەوت؟

دیدەوان: نا.. ئەوەیان ساماڵ پێی وتم.. ئەوانە هیچی گرنگ نیین کاکە.

گوڵزار: ئاهـ باوکی من ڕۆ بۆ ئەم هەموو فرتوفێڵەی ئەیکەن، جا وەرە دەربەرە؟!

عارف: دەی ئێوە ئیشی خۆتان بکەن، با یەکێک من بگەیەنێ.

دیدەوان: ساماڵ گیان بیگەیەنە.

(( دوای خواحافیزیی و ڕۆشتنی ئەوان))

دیدەوان: دەی ئێستا سزای شەنیای ناپاک.. ئەو شەنیایەی سەروەت و سامانی هەموو گروپەکەی بە چاوچنۆکیی و گەوجێتیی خۆی لە دەستدا..

شەنیا: دیدەوان من هاوسەری ئەو برایەی ڕامانم کە خۆتان کوشتتان و یەکە پیاوی ئێوە دەرچوو و تۆشم لە کوشتن ڕزگار کرد.

دیدەوان: بێ ئەقڵ ڕامانی چی و برای چی؟ هەی ترحێو.. تۆ چۆن ئەوەندە گەوج بووی وابزانی برایەکی ئەو ڕامانە داماوە لە ماوەی دوو سێ ڕۆژا فێری زمانی چینە ئەرستۆکراتییەکەی شار بێ؟ بە ڕاستیی بەزەییم بە ئەقڵتا دێتەوە.. (( تورە)) ئێستا سزاکەی چییە؟ قسە بکەن.

سەرچڵ: خۆت بڕیار بە.

گوڵزار: ئەگەر کوشتنە، بیدەنە دەست خۆمەوە، لە دوورەوە نیشانەی لێ ئەگرمەوە.

ڕەوەز (( تفێکی تێ ئەکا)): لەتوپەت بکرێ و دەرخواردی سەگ بدرێ.

دیدەوان: هاهاها ئەی ساماڵە مافیاکەی هاوسەری ئەڵێ چی؟

ڕەوەز: ئەویش قسەی خۆی هەبوو لێرە بووایە.. شتێک بڵێن و با ئیتر ئەم بابەتە لێرەیا داخرێ و کەس هەڵینەداتەوە.

دیدەوان: زۆر تەواوە، ئەوە بەرنامەی گروپە.. سەرچڵ!!.

سەرچڵ: بەڵێ.

دیدەوان: خۆت و گوڵزار بیبەنە ئەودیو و جورعەیەکی بدەنێ تا شەو، شەوێ سێ جورعە مۆرفینی لێدەن و بیبەنەوە بۆ کاولەکەی خۆی،.. با وەکو سەگ بتۆپێ و کەس دەستی بە خوێنی گلاو نەبێ و پۆلیسیش وا بزانێ، بە هەڵە مۆرفینەکەی بەکارهێناوە.

سەرچڵ: بەڵێ باشە.

گوڵزار: وەی ڕوحەکەمیت، کوشتن بە جۆری جیاواز.!!! سوپاس بە منت سپارد، بەدیاریەوە دائەنیشم تا ڕوحی دەرئەچێ کە خۆشە هههە.

Cut

دیمەنی – ١٤٩٣ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفەو ئامۆ))

ئامۆ: پیاوێکی باشە، هەڵبژاردنەکەت لە جێی خۆیەتی ترێ گیان.

تریفە: ڕاستییەکەی هیچیتر نەوتراوە، هەر ئەوەندەی وتی ئەمەوێ بێمە پێشەوە.

ئامۆ: ئەزانم بەساقەوبم، خۆ حمە خدر مناڵ و مەزم نییە خەریکی دڵداریی و ئەمسەرو ئەوسەر لێگرتنت بێ.. تۆش ماشەڵڵا ئەوەندە لە ئەقڵەکەت ڕائەبینم، بوار بە کەس نەدەی مناڵانە لەگەڵتا بجوڵێتەوە. شایانی یەکن، پیرۆز بێ.

تریفە(( سوعبەت)): یەعنی مەنجەڵ و قەپاخەکەین؟

ئامۆ: هەر ڕێک!

تریفە: من ئیتر هیچ کێشەیەکم نییە، چاوەڕوانی عیددەکە ئەکەم تەواو بێ و ئێمە دەست پێ بکەین.

ئامۆ: ئەوپەڕی هاوکاریشتان ئەکەم، بەس تۆ دڵخۆش و ئاسوودە بی، گوڵەکەی من.

تریفە: سوپاس ئامۆ گیان.. تیرۆژ باسی کردی زۆر گۆڕاوی باوەڕم نەئەکرد.. بەڵام بە حەق زۆر زۆر باش بوویت قوربانت بم.

ئامۆ: زیاتریش بە دڵتان ئەبم گلێنەی من.. ئەوی ئێوە پێتان خۆش بێ و پێتان باش بی، هەر ئەبێ ئەوە ببێ، من کێم هەیە لە ئێوە زیاتر؟

Cut

دیمەنی – ١٤٩٤ – ڕ/ن – ژوورێک:

(( لە ژوورێکدا کوڕێکی گەنج لەسەر کۆمپیوتەرێکەو خدر بە دیارییەوە ))

خدر: ئێستا کێت هاک کردووە.

گەنج: کۆمپیوتەری کەسێکە، لینکی لەگەڵ ئەوی پێشووا هەیە، ئەوی بە ناوی مریەمەوە ئیمەیڵی هەبوو.. توخوا یەک دەقە، نامەیەکی تیایە، بزانین کێ نوسیویەتی.. ئا دیدەوان ناوێکە.

خدر: ئەوەم مەبەستە، ئادەی باوکەکەی باوکم، قوربانت، جارێ نامەکەم بۆ بخوێنەرەوەو دواتر بۆ وێنەکان بگەڕێ، نەک لێرەش دایبنێ.

گەنج: سڵاو کاک هەوراز.. ئێمە ئامادەی کارین، هیچ کێشەو جوڵەیەک لە دژی ئێمە دیار نییەو سەلامەتین.. ئێوەش هەوڵ بدەن بێنە ناوەوەو با ئیتر دەست پێ بکەینەوە.... دیدەوان.

خدر(( شت ئەنوسێ)): ئادەی بۆ وێنەکان بگەڕێ و دواتر بۆ ئەو هەورازە.. ئیمەیڵە؟

گەنج: بەڵێ.. پێشتر چاودێریی لەسەر هەیە. بە مۆبایلیش هەر کراوەیە.

خدر: ئێستا؟

گەنج: بەڵێ.

خدر: ئەگەر ئەتوانی بە پەلە بچۆرە ئەو مۆبایلەشەوە.

گەنج: ئەی وێنەکان؟

خدر: دواتر وەرەوە سەری.

(( گەنجەکە کەمێک سەرقاڵ ئەبێت ))

گەنج: هەمان ئەو وێنانەش لەوێ هەن. بیسڕمەوە؟

خدر: بە پەلە.. دواتر ناوی هەموو پەیوەندییەکانی مۆبایلەکەشم بۆ کۆپیکە قوربانت.

(( گەنج کەمێکیتر مشغوڵ ئەبێ و پرینت ئەکاو ئەیداتە خدر، خدر قەدی ئەکاو ئەیخاتە ناو ئەوراقەکانیترەوە ))

گەنج: تەواو.

خدر: بچۆرەوە کۆمپیوتەری پێشوو.. ئەتوانی بگەیتە مریەمەکە؟

گەنج: کاتی ئەوێ.. (( پاش کەمێک)) ئەوە وێنەکانە، وا ئەیسڕمەوە، بە هیچ بەرنامەیەکیش نەتوانێ بیگێڕێتەوە.

خدر: زۆر باشە دەستخۆش.

گەنج: هەوڵی ئەوی مریەمیش ئەدەین، هەرکاتێ دەستم کەوت ئاگادارت ئەکەمەوە گەورەم.

خدر: زۆر باشە دەستخۆش.. من چاودێریی ئەوی مریەمەکەو هەورازو دیدەوان، بە مۆبایل و کۆمپیوتەرەوە بە تۆ ئەسپێرم، قوربانت هەر ئاماژەیەکی لەو جۆرە یان جفرەیەکت بینی، بۆ ژمارە تایبەتەکەمی بنێرە.

Cut

دیمەنی – ١٤٩٥ – ش/د – بەرەمی ماڵی شەنیا:

(( شەنیا هەردوو دەستی لە پشتەوە بەستراوەتەوە لە ناو سەیارەکەدایە لەگەڵ گوڵزارو سەرچڵا ))

شەنیا: وەک دواداواکاریم تکایە ئەوەم بۆ بکەن.. خۆ من ئەمزانی هەر یەکێک لە ئێمە، زۆر بە ئاسانیی لەسەر دەستی خۆمان دووچاری کوشتن ئەبێتەوە.. سەرچڵ چۆن نزیکترین هاوڕێی خۆتت کوشت و منیش ڕەمزی مامۆستام و هەموو ئەوانیتریش کە کوژران.. ئێوەش کە ئەمێنن، هەر بە دەستی هاوڕێی خۆتان ئەکوژرێن، بە فەرمانی گەورەکانتان.. تا گەورەتان هەبێ، بیر لە ژیان مەکەنەوە.

سەرچڵ: منیش ئەوە ئەزانم، بەڵام لەسەر فەرمانی دیدەوان هەر ئەبێ ئاوا بکوژرێی.

شەنیا: زۆر ناشرینە سەرچڵ نەتوانی فەرمانی گەورەکەت بشکێنی، هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەئەکردی، تۆ ملکەچی کەسێکیتر بیت، کە وەک خۆت مرۆڤەو هیچی لەتۆ زیاتر نییە.

گوڵزار: من دیمەنی مەرگەکەتم ئەوێ، ئیتر بە هەر جۆرێک بێت.. مادام ئەڵێی ملکەچن بۆ گەورەتان، من ملکەچ نابم و یاخی ئەبم و خۆم گەورەی خۆم ئەبم، بۆیە حەزم بە سووتاندنەکەت زیاترە.

شەنیا: سەرچڵ تۆش بۆ یەکجار لە ژیانتا خۆت بە.. ئەزانی گەر لەسەر قسەی ڕەمزی ڕاماڵت نەکوشتایە، ئەو لەسەر تۆ خۆی ئەدا بە کوشت؟

سەرچڵ: ڕاستە.

شەنیا: کەواتە تۆ کەسێکیتر ئاراستەت ئەکات و هەرگیز ناتوانی خۆت بیت.

سەرچڵ: نا، ئەمجارە خۆم ئەبم شەنیا.. منیش لەگەڵ ئەوەدام بتسووتێنین.

شەنیا(( قاقای پێکەنین)): ئێستا هەردووکتان لاتان وایە، بۆ یەکەمینجار ئەبن بە خۆتان و سێبەری کەس نابن.. بەڵام لەسەر داوای ئەو گەورەیەتان، من ئەکوژن.. من سوپاستان ئەکەم ڕاتان گۆڕی، بەڵام ئێوە هەر ملکەچن. ______ Cut ______

دیمەنی – ١٤٩٦ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و مریەم.. مریەم پانتۆڵ و تیشێرت لەبەراو قەمسەڵەکەی لە تەنیشتیەوە داناوە.. دانیشتوون))

مریەم: کوشتنی شەنیات ئاقڵانە بوو، هەموو شتێکی شاردەوە.

دیدەوان: ئەی وەرە دوو کەسی خۆ بە ئاقڵ زانی وەک ڕەمزی و شەنیا، نەزانن ژنە کۆنەکەی دارەوان کامێرای چاودێریی بە دزییەوە لە هەموو کارگەکەدا دانابێ.. شەنیاشی تیایە ئەچێتە ژوورەکەوە لەگەڵ ڕەمزیا، ئەوسا شەنیا نەیئەتوانی نکوڵیی لێ بکاو، هەموو مانی بە گرت ئەدا.. بۆ وەک بیستبێتت گومانی لە ڕەمزیی هەبووە، وا کامێرای بۆ داناوە؟

مریەم: نەخێر، ئەوەی بیستم گوایە، ئەو نیگارە هەندێک پارەی لێدزراوەو نەیوستووە کەسیش تۆمەتبار بکا، ئەمە پێنج شەش ساڵێک لەمەوپێش ڕوویداوە، دوای ئەوە شەوێک بە دزیی ڕەمزی و هەموو کرێکارەکانەوە، ئەو کامێرا بچووکانەی چاندووە، لەناو دیوارەکانیشا بووە ماڵێکتە.. ئیتر کە دزیتری لێ نەکراوە، ئەویش کامێراکانی هەڵنەگرتۆتەوەو بۆ ئێستا لە سزا ڕزگاری کرد.

دیدەوان: زۆر ڕاستە، ئەگینا بەسەر ئەوا ئەشکایەوەو بە هیچ ڕزگاری نەئەبوو.

مریەم: هەورازیش وتی چاوەڕوانی ئەوانم با یەکتر ببینین.

دیدەوان: زۆر باشە، مانگێکە هەر ڕزاین لەناو ئەم دیوارانەدا.. کوڕەکانیش پێیان خۆشە ئیتر دەست پێ بکەینەوە. من خەڵکی تریشم هەن، با ئەوانیش ئاگادار بکەمەوە، کە بەم نزیکانە کاروانمان ئەبێت.

مریەم: تا تۆ ئەوە ئەکەیت و ئامادە ئەبن.. منیش ئەچم سەرێکی سەرچاوەکە ئەدەم، بزانم کەی ئامادە ئەبێ.

دیدەوان: عارفیش ئەبەی؟

Cut

دیمەنی – ١٤٩٧ – ش/ ن – ماڵی ئاوا:

(( نیناو ئاوا بە جلی زستانەی تەواوەوە لە ئاهەنگ دێنەوە))

نینا: وەیش مردم، بەخوا جەژنی خۆمم دەرکرد.. مردین ئەوەنە لە تەعزێیا سنگ لە ئەرز بسووین و قژی خۆمان بڕنینەوە.

ئاوا: ئەرێ تۆ لەو بڕوایەدا بوویت حەمە خدر ئەو هەموو خزمەی هەبێ؟ ئەوە چی بوو؟ ئەی تۆ ئەو هەموو دانس و هەڵپەڕکێیەت لە کوێوە هێنا؟.. زۆر جوان بووی نینا.

نینا: یاخوا هەموو شتێکی زۆر بێ، دەردوبەڵا نەبێ.. بەساقەی بم، هەموو شتێکی قابیلە.. کورە ئەو بۆ تا هەتایە ڕزگاری کردم، خوا خوام بوو ڕۆژێکی وا بێت و خۆمی بۆ بکوژم ئەوەنە هەڵپەڕم.

ئاوا: جا ئەوە بۆ تریفە بوو، یان حمەخدر؟

نینا: بەخوا فەرقیان نییە، بۆ هەردووکیان بوو، ئەزانی تریفەش چەند چاکە.

Cut

دیمەنی – ١٤٩٨ – ڕ / ن – ماڵی باوکی خدر:

(( باوک و هەرمێ و غەمگین تازە لە خەو هەستاون، باوک نەبێ))

باوک: ئا ڕۆڵە بچۆ ئەو یەکانەیەش هەستێنە، با بێ قوزەڵقورتەکەی بخوا.

غەمگین: ئەڵێم با لێیگەڕێین تێرخەو بێ مامە، ئەمشەو ئێمە خەوتین ئەو هەر مایەوە (( هەڵئەسێت و ئەچێ کۆمەڵێک تەیارەو قۆری و دەمانچەو بەلەم و هەموو ئەو شتانە ئەهێنێ کە بە کاغەز دروست ئەکرێن ))ئەها چی دروستکردووە؟ هههههه.

هەرمێ: بەخوا دیارە بیری مناڵەکانی ئەکا گوناحە.

هەندرێن(( دێت، ڕیشێکی درێژی یەک مانگیی هاتووە)): بەیانیتان باش! ((وەڵام))

باوک: بەیانی چی کوڕم بانگی عەسری دەمێکە داوە.

هەندرێن: ئێوەش ئێستا هەستاون؟

غەمگین: بەڵێ.

باوک: وەڵا من لە جێیا خۆم بۆ ناگیرێ، لە بانگی بەیانییەوە بەخەبەرم، خۆم پاروویەکم دروستکردو خواردم، لە چێشتەنگاوەوە سک ئەگوشم، باش بوو کچەکە خەبەری بۆوە.

هەندرێن: بەخوا ئەمە دەری ناهێنێ، من هیچ تەحەمولم نەماوە، مانگێکە لە هەموو دنیا بێخەبەرم، خەریکە شێت ئەبم بۆو مناڵانە.

باوک: بڵێ بۆ دایکی ئەو مناڵانە هههه.

هەندرێن: ناوەڵا کەمتر ئەو، دوێنێ جوابێکم بۆ کاک حەمە خدر نارد ئەڵێم ئینتەرنێتێکم بۆ بنێرە، وتوێتی قەدەغەیە. هههه

باوک: دە دیارە ئەزانێ باش نییە، بە قسەی بکە کوڕم، پێموتی دوو مانگی تیا ئەبی، هیچ نییە مانگێکت ماوە، پشووت درێژ بێ.

هەندرێن: بەخوا ناتوانم مانگێکیتر ئاوا بژیم، ئەمڕۆ لەگەڵ بەختیارا ئەچمە دەرەوەو ناگەڕێمەوە.

هەرمێ: نا نا بە قسەی کاکە حەمەخدر بکە کاک هەندرێن، دیارە ئەو ئەزانێ دنیا ساف نییە.

باوک: سەری خۆت مەیە بە فەتارەیەکا ڕۆڵە! دانیشە، چیت نەکراوە؟ لە تەڕ ئەخۆیت و لە پەڕ ئەخەوی!

هەندرێن: هەموو گیانم سست و خاو بۆتەوە، بەخوا ماوەیەکیتر تاقەتمان نامێنێ بچین چۆڕێ ئاویش بخۆینەوە.

هەرمێ: جا فەرقی تۆو کاکە چییە؟ من لە خزمەتتام، هەرکاتێ تینوو بووی پێم بڵێ ئاوت بۆ ئەهێنم

Cut

دیمەنی – ١٤٩٩ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و هەورازو گوڵزارو سەرچڵ و زاهیدو ڕەوەزو ساماڵ))

ڕەوەز: بەخوا پێ خوار دابنێ، بە فیشەک کاسەی سەری هەڵئەگرم.. ئەمە یەعنی چی؟

دیدەوان: هەڵەشە مەبە کاکە، ئەڵێی فیشەکە شێتەی لە خۆتەوە ئەچی بە ئاسمانا؟ ئێ حەقی خۆیەتی، کابرا ژنی هێناوەو ئەیەوێ دوو هەفتەیەک لەگەڵ ژنەکەی بژی و دواتر خۆی بۆ ئێمە تەرخان بکا.

ڕەوەز: جا کاتی لێ بڕابوو ئێستە نەبێ؟

گوڵزار: ژن هێنان و کات ڕەخسان، وەک حەبی سەرێشەو تەختەسڕ وایە.. هههە پەیوەندیان چییە بەیەکەوە؟

هەوراز: نەیئەزانی ئیشەکە کەوتۆتە ئەم کاتەوە؟

دیدەوان: بە چیبیا بزانێ هەوراز گیان؟ خۆ ئەو ئاگاداری پلانی ئێمە نییە.. ئەو چوزانێ حەفتە زیاترە خەریکین؟

زاهید: کورە ڕەنگە هەر بێ ئومێدیش بووبێ و وایزانیبێ ئیتر ئیش ناکرێ.

دیدەوان: ڕاستە.. یەڵڵا با ئەم ئیشە خۆمان بەڕێیکەین و دوای ئەمە ئیتر ئەیدەنە خۆی و خەسووی و پیاوەکانی.. ساماڵیش وەک مافیا نێودەوڵەتییەکە ڕێ و شوێنی بۆ دانێ.

ساماڵ: من لە خزمەتام بۆ هەرچییەک بە منی بسپێرن.

هەوراز: ئەی بۆ خەسووەکەی نەخەینە ناوەوە ئەمجارەش؟

دیدەوان: بە کەڵک نایەت.. جاران بووایە ئەوەمان ئەکرد، چونکە ئەو ژنە خدری تەنها بۆ پارە پەیاکردن ئەویست، ئەگەر تیاشبچووایە زۆر بە خەیاڵیا نەئەهات، ئەو خۆی خدری ئاراستە ئەکرد.. بەڵام لەمەودوا گۆڕا.. مێردی کچییەتی، نە خۆی ئیش ئەکا، نە خدریش بەو جۆرە ئەکاتە سوورەی بەر لەشکر.

هەوراز: کەواتە ئیتر بۆ چاوەڕێی خدر ئەکەن؟

دیدەوان: من باسی بیرکردنەوەو ئیشی ئەوم بۆ کردی نەک هی خۆم.. بۆ من ئێستا خدر بەکارترە لە جاران، بە پێچەوانەی خواستی ئەوانەوە.

گوڵزار: شتێکی پیسە.. ڕەزاقورس!!!

دیدەوان: ئەزانم.. خۆ منیش لەبەر چاوە بازەکەی نایخەمە سەر ئیش.. من ئێستا پارەم لەو ئەوێ، ئەو ئەزانێ ئێمە کە ڕەحم بە ژنی ئاوای ژنبرای و شەنیای خۆمان و زاواکەی نەکەین، ڕەحم بە خەسووی و ژنەکەشی ناکەین.. ئەویش بۆ سەلامەتیی ئەوان ناچارە ئیشەکە چەند مەترسیداریش بێ، مل بدات و هەرچییەکمان بوێ، ڕەتی ناکاتەوە.

سەرچڵ: جوانە! جوانە بلیمەت.. خەسووی ئەیەوێ ئەو بپارێزێ و ئەویش ئەیەوێ خەسووی و منداڵەکانی و ژنەکەی.. زۆر جوانە.. بە خدر ئەوان پارێزراون، بەڵام کە خەسووی بیەوێ خدر بپارێزێ، کەس بێوەی نابێ.

دیدەوان: ئافەرین، بەوجۆرە ئێمە نەک هەر خدرەکەی جاران ئەبەینەوە، بەڵکو داشە هارەیەک بەرئەدەینە بازاڕ.

ڕەوەز: وایە ئەبێ بە ئۆڵف دۆگ!

هەوراز: چۆن ئەمەی تێ ئەگەیەنیت؟

دیدەوان: هەهە خۆی زۆر دەمێکە تێیگەیشتووە هەوراز گیان.

ساماڵ: ئەو ئۆڵف دۆگەش زنجیرەکەی ملی بە دەستی خۆمەوە ئەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٥٠٠ – ش / ن – ماڵی زوبێری تازە:

(( زوبێر بە پاڵکەوتنانەوە لەسەر قەرەوێڵەیەک، دەوران لە ژێر باڵە شکاوەکەی دایکیایەتی ژێر باڵەکەی تریشی دارشەقێک.. ئامۆ لەگەڵیا بە هێواشیی پیاسەی پێ ئەکەن.. ڕێژوان و سەلواو بروسک و چیمەن لەوێن.. ))

زوبێر ئاگاتان لێی بێ ئازاری نەدەن.

دەوران(( سوعبەت)): خەمت نەبێ، لەوێوە گرت تێ بەربوو. هاهاها.

ئامۆ: ئەی وایە باوەڕکە ئێستا لە تۆ زیاتر دڵی پێی ئەسووتێ.

زوبێر: کورە هەردڵم؟ کسپە بە جەرگیشما دێت. هههە.

چیمەن: بەخوا باوکم زۆر عاتیفییە، ئێستا بەس من ئاگام لە دڵیەتی.

زوبێر: خراپە.. ئەوە خراپترین و گەورەترین کێشەی دەروونیی منە.. چارەسەریشی نییە، چەند ئەمەوێ وەک کەسانێکیتر دڵم بکەم بە بەردو ڕەقی هەڵێنم، پێم ناکرێ.

بروسک: بۆ نمونە ئەگەر لە جەنگێکا سەربازێک بە برینداریی جێ بمێنێت و دڵنیاش بێ لەوەی ئەو شتەی لە پێناویا ئەجەنگێ، هیچ پەیوەندیی بە خودی خۆیەوە نییەو پڕ کردنەوەی داواو خواستی خەڵکانیترە لە سەروو خۆیەوە.

زوبێر: ئێ!

بروسک: چەند بەستەزمانترە لەوەی کەسێک بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکی خۆی توشی ئازارو دەردەسەریی خۆی ئەبێتەوە؟

زوبێر: یەکەم بەوەدا تێگەیشتم ئەتەوێ بە قسەی خۆتەوە سەرقاڵمکەیت و چاو لە سەر نیگار هەڵگرم، کە پرسیارەکەت، هیچ پەیوەندیی بە عاتیفیی بوونی منەوە نەبوو. دووەمیش جەنگ لە کوێ و بەرژەوەندیی کەسەکان لە کوێ و سێیەمیش تۆ ئەزانی بەستەزمان یەعنی چی؟ ئەوە بولبول و کەنارین بەستەزمانن هههە.. ئاگاتان لە ژنەکەم بێ، وریا بن هههە! __________ Cut __________

دیمەنی – ١٥٠١ – ش / ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ زۆر گەشاوەو خدرو تریفەو نارەوەنیش دڵخۆشن.. هەندرێن بێتاقەت کەمێک))

هەندرێن: تکات لێ ئەکەم ڕێم لێمەگرە کاکە حەمە خدر گیان.. باوەڕ بکە کوشتنەکەم لەو زیندانە لا خۆشترە.. خۆ ڕێک زیندانێکە بۆ خۆی.. تۆ ئەزانی دەستبردن بۆ ئازادیت چەند گرانە؟

خدر: ئەی چۆن نازانم برا گیان، بەڵام ئیتر ئەوی تۆ کاتی پێچووەو هیچ هەواڵێکی تریشم لەسەر تۆ دەست نەکەوتووە، نە بە چاک و نە بەخراپ.. من بۆ تۆمە، خۆشم ئەوێیت و نامەوێ لەبەرچاومان ونکرێی.. کەیفی خۆتە.. ئەچیتەوە بۆ ماڵەوە بڕۆ بەڵام ئیتر من بەرپرس نیم.

هەندرێن: بیرم لەوە کردەوە ئاگاداری پۆلیس بکەینەوە.

نارەوەن: بەڵگەت چییە؟ هەیەو نییە کەسێک بە دزیەوە گوێی لەو قسەیە بووە.

هەندرێن: جا ئەو دێت شایەتیی بدات؟

خدر: یەک شایەت بۆ لێکۆڵینەوە کەڵکی هەیە، بەڵام بۆ ئیدانە بەس نییە ئەگەر بەڵگەی بەهێزی لەگەڵ نەبێ.. کاتێ ئەوانیش بزانن سیخوڕیان بەسەرا کراوە، ژیانی ئەو کەسە ئەکەوێتە مەترسییەوە.

هەندرێن: ئەی چۆنە بڵێت ناوم مەبەن؟

خدر: ئەگەر ناو نەبرێت، بە هیچ جۆرێک بە شایەتیش ناخوا، چونکە ئەبێ بە هەواڵدەری نهێنیی و ئەو کاتە بەدوای سەلماندنا ئەگەڕێن و قسەی هەواڵدەرەکەش بە هەند وەرناگیرێ.

هەندرێن: کاکە ئەم ماوەیە تۆو تریفە خانیش نایەنەوە، هەموو ئەرکەکە بەسەر شانی نارەوەن خانەوەیە گوناحە، بەخوا ئەوەم زۆر لا قورسە، من ئەچمەوە سەر ئیشی خۆم.

نارەوەن: وەڵا بابە لەبەر من مەیەرەوە، هیچی ئەوتۆ نییەو با نەشڵێن لەبەر من کوژرا.!

هەندرێن: ئێوە دڵنیان لەوەی ئەکوژرێم و منیش هیچ لە خۆما شک نابەم.

تیرۆژ: ئەرێ ئەوەندەی بەم منالییەی خۆمەوە تێگەیشتم، دڵنیام ئەو پیاوە ناچێتەوە بۆ ئەوێ، کە ناوی ناوە زیندان و حەزی لە دەرەوەو ناو منالەکانییەتی.. باشتر وا نییە لێیگەڕێن سەربەست بێ؟

خدر: تیرۆژ ڕاست ئەکا.. برا بە دڵی خۆت بکەو حەزت لێیە لە سبەینێوە بچۆرەوە سەر ئیشی خۆت و ئێستەش پێت خۆشە بچۆرەوە ماڵەکەت.

Cut

دیمەنی – ١٥٠٢ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

Mute

(( دوو کەسی نادیار دێن و لە میوتیدا قسە لەگەڵ دیدەوان ئەکەن کە تەنهایەو کەسیتتر لەوانی پێشوو لەوێ نەماون.. بە دەست و پەنجە وەک ئامارەی کۆلانێک بکەن.. دیدەوان بزەو سەر ئەلەقێنێ.))

Cut

دیمەنی – ١٥٠٣ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

بەهێز: چی بکەین؟ لە هیچ شوێنێکەوە سۆراخی نییە، ئەوەی لەسەرمان بوو بە فەرمانی دادوەر شێوەو وێنەی و ناو و هەموو وەسفە دیارەکانیمان گشتگیر کردووە بۆ هەموو نەخۆشخانەو بنکەی پۆلیس و هەر شوێنێکیتر پێویستی کردبێ.. بەدواداچوونیشمان بۆ کردووەو کەمتەرخەمیمان نەکردووە.

ئاری: برایەکی گەورەی دڵنیا لە ژوورەکەی منە، پێی بڵێم چی گەورەم؟

بەهێز: هەر ئەوەی پێ بڵێ و بە داخەوە هیچ کەسێک نەیبینیوە.

ئاری: بەسەرچاو گەورەم.

بەهێز: لەوێشەوە بە مولازم سەریاس بڵێ، جارێکیتریش جەختی لەسەر بکاتەوەو بڵێ بەدواداچوونێکیتریش بۆ ون بوونەکەی دڵنیا بکاتەوە.. دوای ئەوە دادوەر ئاگادار ئەکەینەوە، بەڵکو لە ڕێی هێڵی مۆبایلەکەیەوە، ئەو ژمارانە وەرگرین کە ئەو ڕۆژەو پێشتریش پەیوەندییان پێوە کردووە.. بە تایبەت دوا پەیوەندی.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٥٠٤ – ڕ / د – بەرچاخانەکە:

(( هەندرێن و دڵەو هاوڕێ))

هاوڕێ: هاها کەمێکیش سپیی بوویتەوە، ئەوەش دەسکەوتە.

هەندرێن: حەزم لێیەتی بچمەوە، خوا ئەکا ئەمنێرن؟ ئەمجارە بەڵکو هەر نەگەڕێمەوە هاهاها.

دڵە: دیارە داهاتی باشت پەیا کردووە لەوێ، بۆیە کاک حەمەخدر ئەڵێ ئاگات لێی بێ؟

هەندرێن: خراپ نەبوو، ماڵی ئاوا بێ، وەڵا خۆ خۆشیشە یەکێ پاست بکا.

دڵە: مەڵێ پاست بکا عەیبە بۆ تۆ، شتێکیتر پاس ئەکا، نەک من.. من ئاگام لێت ئەبێ و پاسەوانییت ئەکەم.

هەندرێن: ببورە.. من سوپاسی تۆ ئەکەم کاکە دڵە گیان.. پێی ئەزانم.

هاوڕێ: دەی فەرموو ئەمە چای پێنجەمە ئاگات لە حساب بێ هههە!

(( دیدەوان لە پشتەوە دیارە بە پێ بەرەو ئۆفیس ئەچێ))

Cut

دیمەنی – ١٥٠٥ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( دیدەوان دێتە ژوورەوە، تەنها نارەوەن لە ئۆفیسە.. پەیوەستە بە دیمەنی – ١٥٠٢ – ی پێش خۆی.. پاش سڵاو و خۆشیی دەربڕینی نارەوەن بە بینینەوەی و سوپاسی دیدەوان))

دیدەوان: پیاو وریای خۆی بێ باشترە نارەوەن خان، خوا بەو ڕۆژە نەکا کە گیراین، تیا ئەچین.

نارەوەن: نا ئیشەڵڵا قەت ئەوە ڕوو ناداو تۆ هەر ئاغای باڵاسەرمان ئەبیت.

دیدەوان: جا بەچی ئەچێ چواردەورەکەت بە قسەت نەکەن؟

نارەوەن: کێ حەددی هەیە لە قسەی تۆ دەرچێت.. نا نا هەموو لەژێر فەرمانی خۆتاین.

دیدەوان: دەی ڕوو سپیی بیت.. با پەڕەی کۆن هەڵنەدەینەوەو باسی تازە گرنگترە.

نارەوەن: فەرموو.

دیدەوان: ئێستا خدر بە بۆنەی هاوسەرگیرییەکەیەوە ونە، یاخوا پیرۆزیان بێ.. هەرچەند دەستی خۆتەو زیاتر لە خۆت نزیک کردەوە.. بەڵام بۆ ئێمە زۆر باشە کە وا نزیکتر بینەوە لە یەک و زیاتر وەک یەک خێزان ئیش بکەین.. بەڕاستی هاوسەرگیرییەکەی من و تۆش، هەر خۆم بۆ ئەوە پێشنیازم کرد.

نارەوەن: ئیتر دیارە قسمەت نەبوو.. ئێستا باسی تازە چییە، وتت گرنگترە؟

دیدەوان: بۆ ئیشێک ڕاتئەسپێرم، کە ئەبێ خۆت بیکەی.. تا خدر دەرئەکەوێتەوە، تۆش هەندێ وردە ئیش بکە.

نارەوەن: تۆ ئەمر ئەکەی کاک دیدەوان.. فەرموو!

دیدەوان: ئەمەوێ سەرێکی زیندان بدەی بۆ لای میرنیزامی باوکی شەنیا.

ـــــــ گەڕانەوەی هەیە ـــــــــــ Cut ـــــــــــــــ

دیمەنی – ١٥٠٦ – ڕ / ن – ئۆفیسی تیرۆژ:

(( هەستیی و تیرۆژ))

هەستیی: مەگەر هەر خۆت و خۆی سەری لێدەرکەن.

تیرۆژ: بۆ کاک هەستیی؟ خۆ زۆر ئاڵۆز نییە؟

هەستیی: نا ئاڵۆز نییە، بەڵام دیزاینەکە سێ دووراییش بێ، کێشەی کابرا چارەسەر ناکا، تۆ بینێرە بۆ لای خۆم، با لێی تێبگەم و ئەویش تێ بگەیەنم.

تیرۆژ: کە دیزاینەرەکەی ئێرە وتی بینێرە بۆ ئەو برادەرەی خۆت بە من ناکرێ.. هەستم کرد ئیشەکەی قورس بێ.

هەستیی: هیچ نییە چارەسەری نەبێ، تۆ بۆم بنێرە شتێکی لێ ئەکەین.

تیرۆژ: زۆر سوپاس، هەموو جارێ ئەزێتی تۆ ئەدەین.

هەستیی: هیچ عەزێت نییە.. گرنگ ئەوەیە دەوران گلەیی نەبێ.

تیرۆژ: ئەوە بەڕاستتە؟ من هەر ستایشی تۆی لا ئەکەم، چۆن ئەتوانێ گلەیی بکا؟

هەستیی(( هەڵئەسێ)): ئیتر دەوارانە! گلەییش بکا دەسەڵات چییە؟ هههە.

تیرۆژ(( لەبەری هەڵئەسێ)): نا نا چۆن ئەهێڵم گلەیی بکا؟

(( خواحافیزیی و ڕۆشتنی هەستیی))

Cut

دیمەنی – ١٥٠٧ – ڕ/د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( سەرچڵ و زاهید لە پێشەوەو ساماڵ لە دواوە))

ساماڵ: ئێستا من چی پێ بڵێمەوە؟ ئەو داوای دڵنیا ئەکا لەگەڵ ئەو دوو کچەکەیترا ئیشی پێیانە.

سەرچڵ: پێی بڵێ دوای ئەوەی پەیوەندییەکەیان تێک چوو، ئیتر دڵنیا نایەتە دەرەوەو مۆبایلیشی داخستووە، ئەی خۆ ناچم بۆ ماڵیشان؟

زاهید: هەوڵبە بە ڕێگەیەک بیگەیتێ دەسەڵات نییە.. هەر خۆی کە وتی هەمووتان واز لە مۆبایل بێنن و بەکاریمەهێنن، کێشەی پەیوەندیی بە تەواوەتیی بۆ دروست کردووین. ئەبێ چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە.

ساماڵ: دیارە ئەوەت پێوتووە بۆیە مۆبایلی داخستووە، ڕەنگە هەست بە مەترسی بکا!

سەرچڵ: نە کاکە من و دڵنیا هیچ جۆرە پەیوەندییەکمان پێکەوە نەماوە.. بەڵام تاکەی بە مۆبایلیش پەیوەندیی نەکرێ؟

زاهید: منیش ئەمەوێ ئەوە لە ساماڵ بپرسم، ئەو نزیکترە لە کاک دیدەوانەوە.

ساماڵ: ئەوە لەسەر قسەی کاک هەوراز بوو، تا ئیشە گەورەکە تەواو ئەبێ.. من ئاگام لەوەیە.. ئەی شەنیا چی بەسەرهات؟ ئەوە مانگ زیاترە ئەپرسم و کەس پێم نالێ.

سەرچڵ: تۆ ئەبێ ئیشی خۆمان فێر بی ساماڵ گیان.. تەنها ناوی ئەو کەسانە بێنە کە لە بازنەی باسی ئەو ساتەیان.. بۆت نییە ناوی کەسیتر بهێنی.. کە وتیشت لەسەر ڕاسپاردەی هەورزا ئەوە کراوە، ئەگەر بەدەمیان بگاتەوە، دوور نییە نەتکوژن.. فێر بە ناوی کەس مەهێنە.

ساماڵ: نا خۆ مەبەستەکەم هەواڵپرسینی نییە، بەس ئەو ئێستا بە تەسکەرە ژنی منە، مەبەستم ئەوەیە ئەگەر کوژراوە، با لە تەسکەرەش لای من بسڕێتەوە.

زاهید: کاک سەرچڵ ڕاست ئەکا.. ئەتوانی ئەوە بە کاک دیدەوان بڵێی نەک بە ئێمە.

دیمەنی – ١٥٠٨ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٥٠٥ – ئۆفیسی وەکالەت:

(( دیدەوان و نارەوەن))

نارەوەن: بۆچی بۆ لای ئەو چاوبزە؟

دیدەوان: ئەها.. سۆراخی کچەکەی تەنها بە تۆ ئەکرێ.. ئەویش ڕاستیەکەی تەنها بە تۆ ئەڵێ، چونکە دڵی لێییئەدا بۆ تۆ.

نارەوەن: ئەیرۆ! بۆ کچەکەی شتێکی بەسەر نەهاتبێ؟

دیدەوان: جا تۆ بۆ ئەوەندە لە خەمی کچەکەیدایت؟ کە کچەکەی و ڕەمزی بە نیازی کوشتنی تۆ بوون.

نارەوەن: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ من چیمکردووە تا ویستبێتیان بمکوژن؟

دیدەوان: داماو مەبە نارەوەن.. کچەکەی ئەو گرەوی لە شەیتانیش بردبۆوە.. کەس نەیئەزانی ڕووە ڕاستەقینەکەی کامەیە؟ جۆرێک خۆی نیشان ئەداو جۆرێکیتر بیری ئەکردەوە.. ئەگەر من نەبوومایە، ئێستا کفنیشت زەرد کردبووداماو!.. ئەوان لەسەر ئەوە ئەیانکوشتی کە نەتئەویست بێیتە ئیشەکەوە.

نارەوەن: جا خۆ هەر شەنیا خۆی دەستەودامانم ئەبوو کە نەیەمە ئیشەکەوە.. بەجۆرێک تێم ئالاّ بوو، کە توخنی ئێوە نەکەوم و لێتان نزیک نەبمەوە.. چونکە بەقسەی ئەو ئێوە ئەتانکوشتم، وەڵا بابە کەس سەر لە ئێ.وە دەرناکا

دیدەوان: بۆیە وای پێ وتووی تا بە دەستی ڕەمزی بە کوشتت بدا.. ئێستا ئەوە گرنگ نییە.. تۆ ئەوەم بۆ بکە.

نارەوەن: ئای خوایە چۆن شەیتانت لە ڕەنگی بەنیئادەما دروست کردووە.. ئەو بێناموسە لە کوێیە ئێستا، تۆش ئەتەوێ بیدۆزیتەوە؟

دیدەوان: بۆ ئەوەی ڕێگریی کوشتنی تۆی لێ بکەم.. لێم دوورخستوویتەوە خەمت نەبێ.

نارەوەن: ئەی کەواتە بۆ بچم بۆ لای باوکی و سۆراخی لای ئەو بکەم؟

# (( ئەڵقەی حەفتاو دوو))

دیدەوان: گومانێکی خۆمەو هیچیتر کە باوکی دەستی هەبێ لە ونبوونیدا.. ماوەیەکە دیار نییە.... بە تایبەت کە دڵنیاشمان دیار نییە.. ئەوە گومانەکەی لا دروست کردووم.

نارەوەن: دڵنیا کێیە؟

دیدەوان: برازای خۆمە.

Cut

دیمەنی – ١٥٠٩ – ڕ/د – غازفرۆشی عارف:

(( کوڕێکی گەنج غازێک ئەهێنێ و ئەیگۆڕێ، کە عارف سەرقاڵی غازەکە ئەبێ، نامەیەکی بۆ ئەخاتە شوێنێکەوە کە دواتر عارف بیبینێ.. کە کوڕەکە ئەڕوات، عارف دیقەت ئەدا نامەیەک لەو شوێنەدایە، هەڵیئەگرێت و ئەیکاتەوەو نامەکە ئەخوێنێتەوە ))

<u>عارف مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

عارف گوێ بگرە زۆر بە کورتیی پێت بڵێم.. بەو ژەهرە پیسەی کە خەریکی بازرگانی کردنن پێیەوە، گەنجی ئەم وڵاتە لەناو ئەبەن.. ئەمە یەکەم و دوا ئاگادار کردنەوەتە.. دەستی لێ هەڵنەگریت و هەر جۆرە پەیوەندییەک بۆ ئەو جۆرە بازرگانییە دروست بکەی، دڵنیابە ئاسایشت لێ ئاگادار ئەکەمەوە.. من ڕۆژانە نەک هەر چاودێرییت ئەکەم، بەڵکو ئەشزانم لە دڵی خۆتا چۆن بیر ئەکەیتەوە.. خەریکی غاز فرۆشتنی خۆت بەو هیچیتر ناکەی.. ئۆباڵت بە ئەستۆی خۆت.

ئیمزا: دۆستی نزیکی خۆت.

(( عارف زۆر ئەشڵەژێت و نامەکە ئەخاتە گیرفانی و بە مناڵەکەی لای خۆی ئەڵێ ئاگاداری دوکان بێ ))

Cut

دیمەنی – ١٥١٠ – ڕ- عەسر / ن –ماڵی زوبێرو نیگار:

(( زوبێر لەسەر عەرەبانەیەکەو نیگاریش لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتووە.. زوبێر دەستێکی ئیش ئەکات و بە سەلوا ئەڵێ بەرەو لای نیگار بیباو لە نزیکیەوە ڕایئەگرێ))

زوبێر: ئەزانی ئەو هێلکە کاڵە سوودی زۆر بوو، بەڕاستی شکاوی وا زوو خۆی ناگرێتەوە.

نیگار: ئەی خۆ سەردەمی زوو دکتۆرو خەستەخانە نەبووە، هەر بە شتی سروشتی چارەسەری خۆیان کردووە.

زوبێر: نازانم بۆ زۆرکات بیر لەمرۆڤی چاخی بەردین و پێشترو دواتر ئەکەمەوە.. خۆم ئەخەمە شوێنی ئەوان و بەراورد ئەکەم.. بۆ نمونە ئەزانی ئەگەر ئێستا ئەو سەردەمە بووایە، من و تۆ لە برسا مردبووین؟ چونکە ئیتر نەمانئەتوانی ڕاو بکەین و کەسیش پەرۆشمان نەئەبوو. هەهە

نیگار: جا ئەگەر ئەو سەردەمە بووایە هەهە.. من و تۆش وەرنەئەگەڕاین و وامان بەسەر نەئەهات هەهە ئەی وانییە؟

زوبێر: دەی ئەوە سروشتی مرۆڤە، ئاگات لێیە من لە هۆکار ناکۆڵمەوە، بەڵکو بیر لە دەرەنجام ئەکەمەوە.. یاساش هەروا داڕێژراوە نیگە گیان. لە کەس ناپرسێتەوە بۆ دزی ئەکەیت هۆکارەکەی چییە؟ بەڵکو سزاکەی بەسەردا ئەسەپێنێ.

نیگار: ئاخر ئەو هۆکارە هەمووان هان ئەدا بۆ پەنابردنە بەر کاری نەخوازراو، کە یەکێک ئەوە ئەکاو سزا ئەدرێ، بۆ پاراستنی ڕەوشی گشتییە.. ئەی چۆن؟

زوبێر: ئەوە ڕاستە، بەڵام جگە لەوکەسانەی بە خۆڕسک ئارەزووی دەست بردن بۆ ماڵی خەڵک ئەکەن، ئەویتر بە گشتیی هۆکاری کاتیی هەیە، چارەسەریشی هەیە.. بۆ نمونە کەسێک دزی ئەکات و حەوت ساڵ بە زیندانیی کردن سزا ئەدرێت.. ئەزانی ئەوەی لەو حەوت ساڵەیا تیا خەرج ئەکرێ بدرێ بەخۆی، هەم هۆکاری دزی کردنەکەی نامێنێ و هەم جارێکیتریش دزی ناکاتەوە؟

سەلوا: وەڵا مامە ئەوەی تۆ ئەیڵێی هەمووان وا لێ ئەکا دزی بکەین.

(( پێکەنینی سەلواو نیگار))

نیگار: ئەی ئافەرین سەلوا.. ئەوەی زوبێر ئەیڵێ پاداشت کردنی دزەکانە.

زوبێر: من لەو شوێنەوە قسەی تیا ناکەم کە ئێوە پێی گەیشتوونەتە ئێستا.. من لە ئەسڵی دارشتنی یاساکان و سروشتی مرۆڤەوە قسە ئەکەم.

نیگار: بەخوا شتێکت لێ حاڵیی ئەبم، بەڵام ئێمە لە ئێستادا ئەژین و ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ حامورابی و لەوێوە یاسا بگۆڕین و پەرەی پێ بدەینەوە.

زوبێر: دەی ئەم بیرکردنەوانەی ئێمە بیری مرۆڤایەتییە، بەدوای باشترینا ئەگەڕێین، ئێمە هەڵگری ئایدیۆلۆژیا نیین لە ئێستادا تا بۆ بەرژەوەندییەک بیر بکەینەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥١١ – ڕ- عەسر / د – بەردەرگای ماڵی هەندرێن:

(( ڕێبوار لە دەرگای ماڵی هەندرێن ئەدات و تافان ئەیکاتەوە.. دوای سڵاو))

ڕێبوار: ئیتر مۆبایلەکەت بکەرەوە.

تافان: ژمارەم گۆڕیوە، تازە کۆنەکە ناکەمەوە، هەموو ئەم ژمارە تازەیەمیان لایە.

ڕێبوار: هەر زۆر باشتر.. مۆبایلێکت بۆ ئەهێنم ئەو ژمارە کۆنەت با تایبەت بێ بە خۆم.

تافان: ڕێك ئەکەوین لەسەر ئەوە.. جارێ من زۆر پێویستیم بە دانیشتنێک هەیە لەگەڵ تۆ بۆ دواجار.

ڕێبوار: دواجار مانای چیی؟

تافان: با لەم بەردەرگایە نەبینرێی لەگەڵما، کەی بتبینم؟

ڕێبوار: سبەی سەر لە بەیانییەکەی، لە قاوەخانەکەی جاران.

تافان: باشە خوات لەگەڵ.

ڕێبوار: قەت ئەوەندە سارد نەبووی لەگەڵما؟!

تافان: جارێ خوات لەگەڵ (( دەرگا دائەخاتەوە))

(( ڕێبوار هەر وەستاوەو پاش کەمێک ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٥١٢ – ڕ- عەسر/ د – ناو سەیارەی ئاوا:

(( ئاواو لەتیف))

ئاوا: سوپاس مام لەتیف گیان، باش تۆم خستۆتە عەزێتەوە.

لەتیف: نا بەساقەو بم، من هاوکاریی کوڕی خۆم ئەکەم.

ئاوا: تۆ بڵێ هیچمان لێی هەڵنەکڕان و خۆی سوتاندووە؟

لەتیف: ئیتر دوکاندارەکە وای پێوتم.. وتی چوومە ئاسایش پێموتن شتێکی وا ڕوویداوەو من تاقەتی بەزمی ئەم و ئەوم نییە، سەرلەبەریم بۆ گێڕانەوە،ە بە هاتنەوەی ئەو کوڕەش کە لەگەڵ ڕزگار هاتبوو.

ئاوا: باشە!

لەتیف: ئیتر ئەفسەرەکە هەندێک وێنەی نیشانداوەو لە ناویاندا ناسیویەتیەوەو وتوویەتی ئەمەیە.. ئەفسەرەکەش پێی وتووە، ئەوە تازەکی خۆی سوتاندووە.

ئاوا: کاشکای بمایە، هەر بۆمان ئەدۆزرایەوە.

Cut

دیمەنی -١٥١٣ – ڕ/ د – بەردەرگای ئۆفیسی وەکالەت:

(( دڵە لەبەر دەرگا، بە پێوەیە لەگەڵ هاوڕێ قسە ئەکەن و خدر دێت.. نارەوەنیش لە ئۆفیسەوە دێتە دەرەوەو دڵە کلیلی لێوەرئەگرێت و دەرگای ئۆفیسی بۆ دائەخاو کلیلی ئەداتەوەو ئەویش سوپاسی ئەکا ))

نارەوەن: هاتی خدر گیان؟

خدر: کەمێکم پێچوو ببورە، لای برادەرێک بوم دوایخستم.

نارەوەن: نا باش گەیشتی.. با بڕۆین.

هاوڕێ: ئەگەر زەحمەت نەبێ کاک حمە خدر؟

خدر(( ئەچێتە لایەوە )): بەڵێ، فەرموو.

(( هاوڕێ وێنەی ڕێبوارو تافانی پێ نیشان ئەدا لەبەردەرگای خۆیان ))

خدر: ناردیان؟

هاوڕێ: بەڵێ ئەمە تۆزێکە.

خدر: دەستخۆش، بۆم بنێرە.

(( خدر دێتەوە لای نارەوەن ئەڕۆن بەرەو سەیارەی خدر ))

نارەوەن: خۆ کەسی خراپ نەهاتووە بەمناوەیا؟

خدر: نا.. هیچ نەبوو.

نارەوەن: کەسە خراپەکە لای خۆم بوو هههههە.

Cut

دیمەنی - ١٥١٤ - ڕ -ئێوارە/د - سەیارەی ڕەوەز:

(( هەردوو سەیارەی ڕەوەزو ڕێبوار پێکەوە وەستاون، ڕێبوار ئانیشکی داداوەتە سەر دەرگای سەکنی سەیارەی ڕەوەز، کە جامی کراوەتەوە ))

ڕێبوا: ئەی چۆن؟ تۆ بڵێی نەزانم لەگەڵ خۆما چۆنە؟ ئەو هەر زۆر گەرم و گوڕە.

ڕەوەز: دەی بزانە بەیانی چی ئەڵێ، وریابە بە هیچ جۆرێک دەرفەتی دەست لەکار کێشانەوەی نەدەیتێ ڕێبوار.. کەسی وامان بەدەستەوە نەماوە.

ڕێبوار: ئەگەر هەر بزانم نایەوێ بێتەوە، هەڕەشەی کوشتنیشی لێ ئەکەم.

ڕەوەز: ئافەرین.. ئەمەش دەرئەکەوێ، ئەگەر دەستی ئەو خدرە خوێڕییە نەبوو، هیچم نەزانیبێ.. وا جارێ کاک نادیدەوانیش شیرینیی چووە بەدڵیاو ناهێڵێ ئیشی خۆم بکەم.

Cut

دیمەنی – ١٥١٥ – ش / ن – ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و سەرچڵ و ساماڵ و زاهیدو ڕەوەزو عارف و هەوراز))

هەوراز: ئەی نامەکەی من چی؟ ببورن سیخوڕێک لەناو خۆماندایە، من ناتوانم ئیش لەگەڵ ئێوەیا بکەم.

ڕەوەز: قسەی بەرزونزم مەکە هەوراز.. چەند ساڵە ئێمە وا کارمان کردووەو سیخوڕیشمان تیا هەڵنەکەوتووە.. ئەوە خۆتانن قسە لە دەمتانا ناوەستێ.

سەرچڵ: وەڵا مەگەر سیخوڕەکە ئێوە بن.

هەوراز: دەی کە وای لێهات من لەم ئیشە دێمە دەرەوەو ناتوانم ئیشتان لەگەڵا بکەم ببورن (( هەڵئەسێ))

دیدەوان(( یاری بە دەمانچەکەی ئەکا)): دانیشە کوڕم دانیشە، هەرزە مەبە، چۆن وا بە ئاسانیی ئەدەیتە شەقەی باڵ.. ئەی نازانی ئێمەش بەرنامەی خۆمان هەیە؟

هەوراز: چ سوێندێک ئەڵێن ئەیخۆم، لای کەس ورتەم لێوە نەیەت.

دیدەوان: ورتەو سوێندو بیروباوەڕەکانت هەڵگرەوە بۆ خۆت.. تۆ لەم ئیشەدای واتە تیایدایت، کەس ناتوانێ بێدەربەست بڕوا.

ساماڵ: با لە بەیانییەوە دەستی پێ بکەین تا زیاتر بڵاو نەبۆتەوە.

عارف: من دوای ئەو نامەیە هێزی ئەژنۆم نەماوە.. بڕیار بوو لە بری ئەو خدرە سەگبابە بڕۆشتمایە، بەڵام بەخوا تینی ئەژنۆم نییە.

دیدەوان: هیچ پەلەش ناکەین و گفتی من وەرگرن کە بە سێ ڕۆژیتر، نوسەری ئەو دوو نامەیە وەک سەگ پەت ئەکەم و ئەیهێنمە بەردەمتان. لەبەر ئەوە کەس خۆی تێک نەدات.. بەڵام سەرچڵ بۆ دواجار ئەم پرسیارە ئاراستەی تۆ ئەکەمەوە.. هیوادارم ورد بیری لێبکەیتەوە.

سەرچڵ: فەرموو کاک دیدەوان، درۆیەکتان لە من بینیوە؟

دیدەوان: دوور لە تۆ، نەموت ڕاستم پێ بڵێ، وتم ورد بیر بکەرەوە.. کاتێ گوڵزار شەنیای سووتاند، تۆ بە دیارەوە بوویت؟

سەرچڵ: چەند جارم وت نەخێر، من لە دەرەوە وەستابووم و ئەو شەنیای بە گێژیی بردە ژوورەوە.. سوتاندی و ئەتووت شێتە، لە دەرەوە هەڵئەبەزیەوەو چەپڵەی لێ ئەدا.

دیدەوان: هەمان وەڵامی پێشوو.. سوپاس.

سەرچڵ: گومانت هەیە شەنیای سوتاندبێ؟

دیدەوان: نا.. گومان نییە یەقینە!.. کەس ناتوانێ لێرە ناپاکیی بکا.. هیچ دەرکەوتەیەک ون نابێ دڵنیابن.. خۆی بە پێی خۆی دێتە بەردەستمان، ئەگەر پێچەوانەکەی ڕاست بێ.

سەرچڵ: بەڵام کەسیتری لێ نەبوو، تا ئەوەی سووتاوە شەنیا نەبووبێ.

دیدەوان: تۆ تەواو ڕاست ئەکەیت و لە قسەکانیشتا زۆر باوەڕت بە خۆت هەیە.. بەڵام خۆ شاردنەوەی گوڵزارو دڵنیاو وا تافانیشی دێتە سەرو دوو نامە کردنە سەر عارف و هەوراز، بێ مەرام نییەو کەس لە ئەستێرەیەکیترەوە ئەوەندە بوێریی تیا نییە، ڕێ لە ئیشی من بگرێ، شەنیا نەبێ.

ڕەوەز: ئەویش مردووە.. ئەی حمەخدرەکە چی؟ ئەویش هەر ئەو ڕایسپاردووە لەم کاتەیا ژن بێنێ؟

دیدەوان: نا نا شتەکان تێکەڵ مەکەن.. بەڵام سەرچڵ ئێستا زۆر بە وردیی و هەوڵ بدە هیچ شتێکت بیر نەچێ.. ئەو شەوەمان بۆ بگێڕەوە.. وتم تکایە هیچت بیر نەچێ.

سەرچڵ: ئەوەندەم گێڕاوەتەوە هیچم بیر نەچێ.. لەسەر قسەی خۆت لێرە جورعەیەک مۆرفینمان دایێ و تا شەو بەدیاریەوەماینەوە.. چونکە ئالوودە نەبوو کاری تێکرد.. دواتریش بۆ دڵنیایی خۆمان، پێش بردنی جورعەیەکیترمان دایێ و بە سەیارەکەی من بردمانە ئەو جێگەیەی گوڵزار وتی حەز ئەکەم لەوێ بیسووتێنم.

دیدەوان: چۆن بوو بە قسەی گوڵزارت کردو فەرمانی منتان جێ بە جێ نەکرد؟

سەرچڵ: خۆت ئەزانی گوڵزار لەو ڕۆژەوەی ڕەوەز دوو پیاوەکەی پێ کوشتووە، تینووی خوێنە.. وتی دڵنیابە کاک دیدەوان ئەم ڕێگەیەی زۆر پێخۆشتر ئەبێ و منیش ئۆخەی ئەکەم.. هەوڵمدا تێلت بۆ بکەم، سوێندی دام کە تێل نەکەم، نەک ناڕازیی بیت.

دیدەوان: خراپت کرد.

سەرچڵ: دوای ئەوە گەیشتینە ئەو تەنها ژوورەی کە لە زەویەکەی شەنیایا بوو و گوڵزار پێی ئەزانی.. بە قسەی گوڵزار.

**<u>بۆ فلاشباک</u>:**

______ گەڕانەوەی هەیە ______ Cut ______

دیمەنی – ١٥١٦ – فلاشباک – ش / د - یەک ژووری گڵ لە دەشتێکا:

(( گوڵزارو سەرچڵ بە دەست بەستراویی باڵی شەنیایان گرتووەو بۆ ژوورەکەی ئەبەن))

سەرچڵ: گوڵزار گیان با کاک دیدەوان نارەحەت نەبێ، ئێستاش بیبەینەوە ماڵەکەی خۆی باشترە، کە بە مۆرفینەکە بمرێ، کەس گومانیش ناباتە سەر هیچ کەسێک و ئەڵێن خۆی خۆی کوشتووە.

گوڵزار: دە نا.. توخوا با خۆم گڕی تێبەردەم، زۆر خۆشە.

سەرچڵ(( باڵی بەر ئەدات)): دەی ها هەر بۆ خۆت، بەڵام کاک دیدەوان پرسیاری کرد، من ڕاستییەکەی پێ ئەڵێم.

گوڵزار: دڵنیابە خەڵاتیشمان ئەکا، ئەوسا خەڵاتەکەی تۆش بۆ من باش؟هههه

سەرچڵ: هەر بۆ خۆت.

(( گوڵزار شەنیا ئەباتە ژوورەوەو ئاگر هەڵئەسێت و بە چەپڵەلێدان و پێکەنین و هەڵبەزینەوە دێتە دەرەوەو دەرەوەش ئەسوتێنێ، تا سەقفە دارەکەی ئەڕوخێ))

<u>**فلاشباک تەواو**</u>:

Cut

دیمەنی – ١٥١٧ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٥١٥ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

دیدەوان: زوو ئاگرەکەی کردەوە؟ یان درەنگ.

سەرچڵ: پێی چوو.

دیدەوان: تێبینی کەست نەکرد، لەودیوی ژوورەکەوە بڕوات؟

دیدەوان: کاک دیدەوان گومان لە هیچ شتێک مەکە، ئەوەندەی مۆرفین وەرگرتبوو، توانای باوێشکیشی نەبوو.. گومان کردنیش خۆش نییە، بە ڕاستی ئێستا هەست ئەکەم ئەم دەمانچە ڕاوەشاندنەی دەستت، لەگەڵ منت بێ.

دیدەوان: حاڵیی بوون خراپ نییە، ئەگەر درەنگیش بێت.

سەرچڵ: من پاکانەم بۆ هیچ کەسێک نەکردووە لە ژیانما، گەر ئەمە بە پاکانە تێگەیشتبیت.. ئەمە تەنها ڕوونکردنەوە بوو.

دیدەوان: بە هەرحاڵ وەک وتم، هەموو شتێک ڕوون ئەبێتەوە.. هەموو لایەکیش ئاگادار ئەکەمەوە، با ناپاکیی شەنیا دوا ناپاکیی بێ.

Cut

دیمەنی – ١٥١٨ – ش/ن – ماڵی زوبێرو نیگار:

(( زوبێرو نیگار لەسەر قەرەوێڵە.. ئامۆو بروسک و ڕێژوان و سەلوا دانیشتوون))

ئامۆ: هەموویم خستە بانکەوە.. زۆر ببوو.

زوبێر: دەستت خۆش بێ ئامۆ گیان.. بە تەنیا دەرەقەتی دێیت، یان یەکێ لەو کوڕانە بنێرم لەگەڵتابێ؟

ئامۆ: ئیشەکەی خۆمان هیچ نییە خۆت ئەوە ئەزانی.. هەمووی ژمێریاریی و خۆیەتیی چارەسەری ئەکەن، زۆر جاری وا هەیە هەر بەجێیشی ئەهێڵم، هیچ ناگۆڕێ، بێخەمبە کاکە زوبێر.

بروسک: ئێمە لە خزمەتداین هەر ئیشێکمان پێ بسپێری.

ڕێژوان: ئیشەکەی منیش هیچ نییە، هەرکاتێ پێویستیت بە هاوکار بوو، هەر بە خۆم بڵێ.

ئامۆ (( زەنگی تەلەفونی بۆ دێت و وەڵام ئەداتەوە)): بەڵێ فەرموو! ........... (( ترس و شڵەژان)) چۆۆۆۆن؟!!!!! ......... کەی؟................ باشە وا هاتم، هەر کارگوزارەکە؟ ........... باشە بەساقە ئەگەر نەمردووە فریاگوزاریی خێرای بۆ بکەن......... وا هاتم. (( مۆبایل دائەخاو بە پەلە))

زوبێر(( سەرسوڕمان)): چی بووە ڕۆڵە؟

ئامۆ: کارگوزارەکە چووە ژوورەکەم بۆ پاک بکاتەوە.. غاز لە ژوورەکەیا بەردراوەتەوەو هەر دەرگای کردۆتەوە بەسەریا کڵپەی کردووە.

زوبێر: ئەی هاوار!! جا غاز چی ئەکا لە ژووری تۆیا؟

ئامۆ: نازانم، ژووری من هیچ جۆرە غازێکی تیا نییە، شتێک هەیە، با خێرا بچم.

زوبێر: ئا ڕۆڵە لەگەڵیا بچن.. ئامۆ زۆر بە وریاییەوە بچۆ، نەک داو بێ بۆ ئەوەی ڕاتکێشن بەرەو نەخۆشخانەکە.

ئامۆ: ڕاستە.. با کوڕەکان نەیەن.

بروسک: نەبابە چۆن شتی وا ئەبێ؟

نیگار: ئاگاداری خۆتان بن.

سەلوا: ڕێژوان ئایەتولکورسیت بەسەرا ئەخوێنم خەمت نەبێ.

(( چوونە دەرەوەی ڕێژوان و بروسک و ئامۆ))

Cut

دیمەنی – ١٥١٩ – ش / ن – قاوەخانەیەک:

(( دەوران و هەستیی و تیرۆژ))

تیرۆژ: دەی تۆش دیزاینەری، ئەهلی هونەریت.

هەستیی: تۆ بڵێی منیش بە هەڵە دەورانم هەڵبژاردبێ؟

دەوران: کورە تێ بگە، ئەڵێ کابرا شاعیر بوو، کتێبی شیعریی بۆ ژنە ئەنوسیی، حەوت دانە ساڵ و شتێک عاشقی بوو بێ ئەوەی ژنە گوێ لە یەک وشەی بگرێ هههه.

هەستیی: ڕاستە گوێی لەیەک وشەی نەگرتووە.. بەڵام ئەو ژنە بە نیگاش بێ وایکردووە ئەو حەوت ساڵە شوێنی کەوێ.. ئەی نازانن جاری وا هەیە نیگایەک لە یەک سەعات وتن شیرینترە؟

دەوران(( دەست بە چاویەوە ئەگرێ)): ئەوە نیگاش نەما.. ئیتر دوای چی کەوتووی بە قوربان؟

هەستیی: دوای قسەی دڵت، کە هەرچەند بیشاریتەوە من هەر گوێم لێیە.

دەوران: ئەوە پێی ئەڵێن وەهمی بیستن.

تیرۆژ: ئەی خۆ ڕەنگە گوێشی بزرنگێتەوە وا بزانێ دەنگی دڵی تۆیە.. ئەویش جۆرێکە لە شێتیی.

هەستیی: ئەگەر وەک شاعیرەکەش سەیرم ئەکەی دوای نیگایەک کەوتبێ، من کۆڵ نادەم.

تیرۆژ: بەڵام ئەو داماوە کۆڵیدا.. ئیتر عاشق نەبۆوە.

هەستیی(( سوعبەت)): توخوا ئەگەر نەیبرپیتەوە، ئەوە لە چیرۆکی کەلیلەو دیمەنەو هەزارو یەک شەوە ئەچێ، قسەی باش نازانی خراپ بۆ ئەکەی؟

تیرۆژ: بەخوا بەڕاستمە.. حەز ئەکەی پێت ئەناسێنم؟!

نامەوێ کۆڵدەری وا بناسم.. ئەو ڕەنگە دەستی لە ژیان شتبێ.

تیرۆژ: ئەتەوێ ڕاستت پێ بڵێم؟

هەستیی: نا قسەی ئەوم بۆ مەکە.

تیرۆژ: ویستم ڕێژەی کۆڵدانت تێستکەم.. شاعیرەکە ئەڵێ تا مردنیشم بۆ گەیشتن بەو ئەژیم ئەگەر بۆ تەنها یەک ساتیش بێ.. ئەویش گاڵتەی پێ ئەکردم کە ئەمووت ئینجا چییە؟ ئەم نا ئەو.هههە.

دەوران: چەند ئامادەییت تیایە قوربانییم بۆ بدەی؟

هەستیی: هەموو جۆرە قوربانییەک.

دەوران: من سێ تێستت ئەکەم لەسەر دەستی ئەم خوشکە جوانەم، ئەگەر سەرکەوتوو بی، قسەی دڵی خۆم ئەکەم.

هەستیی: هەرچی تۆ بیڵێی، فەرموو!

دەوران: ئۆو ئەوە کاتی ئەوێ، سێ تێست زۆر زۆرە.. بۆ ئەوەی نەزانی تێستە، ڕەنگە ساڵ بخایەنێ، ڕەنگە زیاتریش.

Cut

دیمەنی – ١٥٢٠ – ش/ن – ماڵی مریەم:

(( مریەم و سەمەد ))

مریەم: وا ئەڵێن، گومانی ئەوە ئەکرێ، مابێت و گروپێکی بکوژیشی دامەزراندبێ.. بۆ لەناوبردنی گروپەکەی دیدەوان.

سەمەد: ئێمە پارێزگاریی لە دیدەوان بکەین؟

مریەم: چوک.. لێیانئەگەڕێین یەکتر بخۆن.. بەڕاستی لە ڕەچەڵەکەوە ئەو گروپەی دارەوان و دیدەوان ڕەمزییە، مەترسیدارن.. بەردەوام کێشەیان هەیەو یەکتری سەرەنگون ئەکەن و لەولاشەوە حوکمەتیش درێغییان لێ ناکا.

سەمەد: کەواتە بگەڕێین شەنیا بدۆزینەوە؟!

مریەم: ئەوەیان باشە، تا هەر ئیشێکیان دۆزییەوەو بە خۆیان نەکرا، خۆمان وەک ئەوەی عارف و دیدەوان، لە شەو و ڕۆژێکا هەڵیلوشین.

سەمەد: ئایندەی ئەو بازرگانییە لەم وڵاتەیا، هەر ئەبێ بۆ خۆمان بێ. دەمخۆش.

مریەم: دڵنیابە لەوەی وا ئەکەم گەورە بازرگانەکان لە خۆم زیاتر متمانەیان بە هیچ گروپێکیتر نەمێنێ.. ئەوەش نزیکە.

سەمەد: ئەو کاتەش هەموو ئەمجۆرە گروپانە ژێر ڕەحمەتی خۆمانەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٢١ – ش / د – حەوشەی نەخۆشخانەی زوبێر:

Mute

(( ئامۆو ڕێژوان و بروسک و خدرو نارەوەن و تریفەو ئاواو نینا دەوری ئامۆیان گرتووەو پۆلیس وەستاوەو چەند پۆلیسێک لە ناو دەرگاکەدان ناهێڵن کەس بێت و بڕوا.. کارگوزارێک و کەسێکی قات لەبەر، ئاماژە بۆ پۆلیسەکان ئەکەن و حەکایەتەکە ئەگێڕنەوە کە چۆن ڕوویداوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٢٢ – ڕ/د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( سەرچڵ تێل ئەکا))

سەرچڵ: ١- (( عصبي)) وتم شوێنەکەت بگۆڕەو تەواو، بە قسەم بکە .......... ٢- ڕۆڵە گیان خۆت ئەو کابرایە ناناسیت؟ ئەڵێ بۆچی ئەوەی وتم واتان نەکردو دوای هەوای سەری گوڵزار کەوتوویت، ئەو گومان لە هەموو شتێ ئەکا، تەنانەت ئەمشەو هەر بە ئاشکرا منی بەوە تاوانبار ئەکرد، کە شەنیا مابێت ............... ٣- هەستم بەوە کرد سوسەیەکی کردبێ و شوێنەکەت ئاشکرا بووبێ ........... ٤- منیش بۆ ئەوە ئەچم، بۆیە هەر ئەمڕۆ کە تۆ چۆڵت کرد، هیچ شتێک لەگەڵ خۆتا مەبە، من ماڵی ناسیاوێکم بە دەست بەتاڵیی ئەهێنمە ئەوێ و سەردانیشیان ئەکەم، ئیتر هیچ نابێ ............ ٥- زۆر باشە، منیش هەر ماڵی کاک حەسەنی ئەودیوتان نیشانی ماڵی ئەو ناسیاوەم ئەدەم.. با لەوێوە بێنە ئەو خانووەوە کە تیایدان و ئێوەش هەر لەوێوە دەرچن ........... ٦- ئۆکەی، بای.

(( تەلەفونیتر ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٥٢٣ – ڕ/ن – ژوورێک:

(( گوڵزار تێل ئەکاو گوڵەبەڕۆژە ئەخوا))

گوڵزار: ١- ئێ ئاخر بۆ؟ چی ڕوویداوە؟ نابێ بزانم؟ ......... ٢- ئەی بتویایە ئەوەی سوتێنرا دایکت بوو یا باوکت؟.. دەبا هەر بۆ خۆی بڵێ. ........... ٣- ئەی کێ نالێ کە تۆ هاتوویت چاودێریت نەکراوە؟ ........... ٤- باشە، کەواتە تەکسیەکمان بۆ بنێرە ماڵەکەی ئەودیو، لەوێوە دەرئەچین ............... ٥- دەی باشە.. نیوسەعاتی ڕێکی تر ئێمە چاوەڕوانین.. بای.

(( مۆبایل فڕی ئەدات و هەڵئەسێ بە خێرایی))

Cut

دیمەنی – ١٥٢٤ – ڕ / د – ساحەی سجن:

(( نارەوەن چاو ئەگێڕێت و دێت بەرەو لای نیزام کە ئەیبینێ، بە گەرمیی و خەندەوە سڵاو و ڕێزو تەوقە))

نیزام: زۆرم پێخۆش بوو هاتی بەساقە، بە ڕاستیی دڵسۆزیی خۆتت بۆ سەلماندم.. دڵنیا بە هەر عومر باقی بێ و خوا بمهێڵێ، کە هاتمە دەرەوە یەکسەر، دێمە داوات.

نارەوەن(( پێکەنین)): کورە هەی سەرشێت هاتنە دەرەوەی چی؟ ئەگەر بێیتە دەریشەوە تا ئەو کاتە من مردووم، خۆ تازە بە تازە گەنج نابینەوە بۆ بەڵێن و بەڵێنکاریی.. ئەو بابەتە لە بیری خۆت ببەرەوە.

نیزام: بەخوا من لە بیرم چووبۆوە، بەڵام بە بینینت وام بە باش زانی چاکەت بدەمەوە.

نارەوەن: نە بابە چاکەی چی؟ ئەوە ئەرکە.. بەڕاستی شەنیاش نابینم هەواڵێکت بپرسم.

نیزام: شەنیا پێش دوو مانگێک هات بۆ لام و پێی وتم وا زوو دەرناکەوم، هەندێ سەرقاڵی گورگەکانم.. وتی هەرچییەکیشیان پێوتی سەبارەت بە من باوەڕ بە هیچ کەسێک مەکە.. ئیتر نازانم، من شەوانە ئایەتول کورسی بۆ ئەخوێنم سەلامەت بێ.

نارەوەن: ئیشەڵڵا سەلامەت ئەبێ، بەخوا بەقەدەر کچەکانم ڕێزی لام هەیە.. ئێ تۆ چۆنی؟ چیت پێویستە؟ هەر شتێ بە من بکرێ!

نیزام: هیچم پێویست نییە.. زوو زوو ناڵێم، ساڵیی یەک جار سەرێکم لێ بدەو هیچیتر، هەر ئەوەم پێویستە.

نارەوەن: بەسەرچاو، داواکەت زۆر قورس نەبوو.. (( عەلاگەیەکی بە دەستەوەیە دایئەنێ)) ئیتر ئەبێ بڕۆم لە دەرەوە چاوەڕوانمن.

نیزام: توخوا بۆ عەزێتت کێشا نارەوەن گیان، بینینی خۆت هەموو شتێکە.

نارەوەن: سوپاس کاک نیزام.. ئاگات لە خۆت بێ.. ئیشەڵا بەسەلامەتیی ڕزگارت ببێ.

نیزام: خوات لەگەڵ بێ نارەوەن خان، زۆر خۆشحاڵت کردم.. ئا با پێت بڵێم، بە ڕاستیی تۆبەم کردووە.

نارەوەن: دەی خوا تۆبەت قبوڵکا.. خواحافیز.

(( نیزام خواحافیزیی و بەڕێکردنی))

______ تابع ________ Cut ____________

دیمەنی – ١٥٢٥ – متبوع – ڕ / ن – ژووری بەڕێوەبەری سجن:

(( بەڕێوەبەری سجن و ڕاهۆزو خدر، نارەوەن دێتە ژوورەوەو پاش سڵاو))

بەڕێوەبەر: من تا دەرەوە ئەچم، فەرموون سەربەستیی خۆتان وەرگرن.

ڕاهۆز(( لەگەڵ خدر لە بەری هەڵئەسن)): زۆر سوپاس.

نارەوەن: ئاگای لێی نییە، خۆی هاتووە بۆ لای و پێی وتووە ماوەیەک دیار نامێنم، سۆراخم مەکە.

ڕاهۆز: زۆر باشە، ئێستا دوا بینینی وەرئەگرین.

نارەوەن: ئەڵێ پێش دوو مانگێک.

ڕاهۆز: بە قسەی خۆی نابێ.

خدر: هەروا باشترە دڵنیا بینەوە، کە ڕاست ئەکا.

ڕاهۆز: ئەها.. تۆ بە دیدەوان بڵێ، شوێنی نیشتەجێی نازانێ، بەڵام ئاگاداریەتی و ئەزانێ وەزعی باشە.. هەواڵیان دامێ ئێستا دیدەوان لەبەر دەرگایە، ڕاتئەگرێت بۆ وەڵامەکەی، تۆ ئەوەم بۆ بکە.

نارەوەن: باشە بەسەرچاو.

خدر: بەڵام تۆ وا زوو مەیەرە دەرەوە کاک ڕاهۆز.. نەک چاودێریی درێژخایەنی دانابێ.

ڕاهۆز: جوانە.. لەگەڵ بەڕێوەبەر دەرئەچم هەر بە سەیارەکەی خۆی، چونکە سەیارەم نەهێناوە.. ئێوە بڕۆن، با کاتی بەڕێوەبەریش نەگرین.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ١٥٢٦ – ڕ/ن – قاوەخانەیەک:

(( ڕێبوارو تافان دانیشتوون))

ڕێبوار: ئامان بڕیاری وا نەدەی!! چۆن شتی وا بە خەیاڵتا هاتووە؟ خۆت ئەبی بە قوربانییەکە!

تافان: من ببم لە هەندرێن باشترە.. بۆ پاراستنی ئەو با من قوربانیی بم.. دوای ئەوە کێ ئەڵێ کاک دیدەوانیش وا بیر ئەکاتەوە؟

ڕێبوار: زۆر دڵنیابە، ئەوی ڕێی لێگرتبێ و بە قسەی نەکردبێ، ئێستا لە ژیانا نییە.

تافان: چش!!! چی ئەکا با بیکا.. من دەستم لە ژیان شتووە، هەڵەی زۆر گەورەشم دەرهەق بەو و بە مناڵەکانم کردووە.. هیچ نەبێ بە ویژدانی ئاسوودەوە ئەکوژرێم.

ڕێبوار: من بە هیچ جۆرێک جارێ ئەم بڕیارەی تۆی پێ ناڵێم، ڕایئەگرم تا فشارم ئەخاتە سەر.. تا ناچار نەبم پێی ناڵێم.. تکایە تافان گیان، تۆش جاریترو دەیتر بیری لێ بکەرەوە با تیا نەچی خۆشم ئەوێی.

تافان: لە بیرکردنەوەیا نەماوە، ناتوانم ئەو منالانەم بە هەتیویی ببینم، کە من باعیسی کوشتنی باوکیان بووبم.. ناتوانم ڕێبوار گیان ناتوانم.

ڕێبوار: ئەی ئەگەر ئەوە بکەم بە مەرجی گەڕانەوەت؟

تافان: نامەوێ جارێکیتر ببمە مایەی کێشە بۆ هیچ کەسێک.. کاکە لێمگەڕێن، تا ئەمکوژن، با مناڵەکانم بە خۆشەویستییەوە بگرمە باوەشم.

ڕێبوار(( متحیر، پاش کەمێک)): ئەو پارەیەت بۆ بێنمەوە کە لامە؟

تافان: سوپاست ئەکەم، کە کوشتتانم، وەک دیاریی کۆمپانیاو کاک دیدەوانی ئیزرائیلم بیدەنە دەست مناڵەکانمەوە... (( پاش هەناسەیەکی قووڵ)) هەستە بمگەیەنە.

(( ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٢٧ – ڕ / ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئامۆو مفەوەزێک ئەینوسێتەوە ))

بەهێز: بە فەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە کە ڕێگەی پێداوین ئەم لێکۆڵینەوەیە تەواو بکەین، وەک ئەندامی دیسپلینی دادوەریی، لەبەرئەوە کاک ئامۆ، هەر شتێکت دێ بە خەیاڵدا باسی بکە گرنگە بۆ ئێمە، دواتریش دادوەر ئەیبینێ.

ئامۆ: ئەو ئیشەی کراوە، جەنابت فەرمووت لە قۆناغی یەکەمدا کلیل پەیا کراوەو دوای ئەوە دوو بوتڵ غاز براوەتە ژوورەوە؟

بەهێز: لۆژیک وا ئەڵی.

ئامۆ: بەڵێ ئەگەر ئەو کارگوزارە ئاگاداری هەر شتێک بووایە وای بەسەر نەئەهات؟

بەهێز: کلیلیش بە خۆت و ئەو کارگوزارە زیاتر بە کەس نییە.. ئەوی خۆتان ئەو دەرگاو پەنجەرانەتان بە کرد دا؟

ئامۆ: ئۆو جەنابی ئەفسەر، شەنیا!

بەهێز: مەبەستت ئەو شەنیایەیە کە لە کارگەی نیگار خان بوو؟

ئامۆ: بەڵێ ئەو دەرگاو پەنجەرەی بۆ دروست کردین و ناحەزیشمە.

بەهێز: بەڵام شەنیا مانگ زیاترە خۆی سوتاندووە.

ئامۆ: چۆن؟ مەبەستت ئەوەیە مردووە؟

بەهێز: بەڵێ، یان ڕاستت بڵێین کوژراوە، چونکە لە هۆدەیەکی چەپەکی دوورە شار لاشەکەی دەرهێنرایەوە.

ئامۆ: جا چۆن دڵنیا بوون ئەوە؟

بەهێز: پێناس و هەندێ کەلوپەلی لە دەرەوەی هۆدەکەیا دانرابوو، بۆیە گومانەکە وایە کوژرابێ.

ئامۆ: باوەڕ ئەکەی کلیل بە کاک زوبێری شەریکیشم نییە؟!

بەهێز: پەنجەرەش نەشکاوە، دەرکەوت هیچیشیان نەکراونەتەوە! بە کامێرای چاودێریش بێ، کەس لە دەرگاوە نەچۆتە ژوورەوە..

ئامۆ: ئیتر خەیاڵم بۆ هیچ شتێکیتر ناچێ.

بەهێز: هەوڵدە زیاتر بیربکەیتەوە.. ڕۆژێک کلیلت دابێ بە کەسێک شتێکت بۆ بێنێ، یان بیرت چووبێ بە دەرگاوە، یا هەر شتێکیتر.

ئامۆ: من و کاک زوبێر هەر زۆر زوو بڕیارماندا خۆمان ئاگامان لە ژووری خۆمان بێ و کەس تۆمەتبار نەکەین بە هیچ شتێک.

بەهێز: پەیوەندیی تۆو کارگوزارەکە چۆنە؟

ئامۆ: گومان لە خۆم بکەم، لەو نا.. وەک باوک و کوڕ وابووین.

بەهێز: باشە سوپاس.. وتەکانت ئیمزاکەو تۆ خوات لەگەڵ.

Cut

دیمەنی – ١٥٢٨ – ڕ/ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و زاهیدو ڕەوەزو ساماڵ))

دیدەوان: ئەو ناونیشانەی وەرتانگرت، ئەو شوێنەیە کە یەکێک لە شەنیاو گوڵزارو دڵنیای لێیە.. لە پڕا هێرش بکەنە سەرماڵەکەو هەموو شوێنێکی بپشکنن.. هەر کامێکیان لەوێ بوون، هەر بە قژ ڕاکێشان تا ئێرە بیانهێنن.. دەستیشیان کردەوە، تەرمەکانیانم ئەوێ.

سامال: ئەی نالێن ژنەکەم کوژراوە؟

ڕەوەز: تۆ دڵنیای شەنیا ماوە؟

دیدەوان: ١٠٠% دڵنیام و لە سەرچاوەیەکی خۆمەوە قسەی لە باوکی وەرگرتووە.

زاهید: هیچی تێ ناچێ و ناونیشانەکە ڕوونە، گەر لەو شوێنەبن بن نیو سەعاتی تر لەبەرپێتا ئەبن؟

ڕەوەز: ئەی چەند دڵنیای لەوێ بن؟

دیدەوان: سەرچڵ هامشۆی ئەو ماڵە ئەکا.

سامال: دەی بۆی مەگەڕێن، با خێرا بڕۆین کوڕینە.

دیدەوان: دەستوبردکەن و زوو بگەڕێنەوە، ئاگاتان لە خۆتان بێ و هەڵە نەکەن، دەی خوا حافیزتان بێ.

(( ڕۆشتنی ئەوان و مانەوەی دیدەوان))

دیدەوان: شت هەیە لە دەستم دەرچێ؟ سوپاس بۆ نارەوەنیش، هەموو دەرگاکانی بۆ کردمەوە، دڵنیام یەکێکیان هەر لەوێیە، ئەگەر هەر سێکیان نەبێ.

(( دیدەوان بە ناو ژوورەکەدا دێت ئەچێ))

———— گەڕانەوەی هەیە ———— Cut ————

دیمەنی – ١٥٢٩ – ڕ / ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

ئاری: گەورەم لەسەر گومانەکەی جەنابت، داوای فەرمانی دادوەرم کردووە بۆ هەڵدانەوەی گۆڕەکەی شەنیا.

بەهێز: زۆر باشە دەستخۆش. کە داوەر فەرمانی کرد، کات و ساتی ئامادەبوونی وەربگرن و کەس و کاری ئاگادار بکەنەوە بێن.

ئاری: کەسی نییە، هەر باوکیەتی و ئەویش لە زیندانایە.. بەڵام گەورەم ڕەنگە کەمێکیش بێهوودە بێت؟!

بەهێز: لەبەرچی مولازم ئاری؟

ئاری: ئەی دی ئێن ئەی لە قژو لیک و لینجیی و خوێن وەرئەگیرێ، ئەم کە سووتابێ، هیچ یەکێ لەو شتانەی نەماوە.

بەهێز: لە دانیش وەرئەگیرێ.

ئاری: جا ئەوە لێرە ئەکرێ؟

بەهێز: لێرەش نەبێ، لە بنی دنیابێ ئەینێرین، خزمەت بە ڕەوتی لێکۆڵینەوە ئەکا، هەر ئەبێ دڵنیا بینەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٣٠ – ڕ / د – ناو سەیارەی دەوران:

(( دەوران و هەستیی))

هەستیی: ئاخر کچی باش ئەوەش بە مەرج و تێست دائەنێی بیکە بە خاتری خوا؟ من چوزانم کاکت لەگەڵ کێ دوژمنایەتیی هەیەو کێ ئازیزیەتی و کێ خۆشی ناوێ؟ کێ نالێ حەزی لە کچێک نەکردووەو کەسوکارەکەی یان کەپڵی کچەکە ئەوەیان نەکردووە؟

دەوران: ئەوەیان تەرککە، کاکم لەو بابەتە نییەو حەزی لە هیچ کچ و ژنێک نییە.

هەستیی: بۆ؟ خۆ نەخەسێنراوە؟

دەوران: قسەی جوان بکە ئەگینا هەر لێرە داتئەگرم و تا ماوی نامبینیتەوە.. وتم خۆت بەوەوە ماندوو مەکە، خۆم کاکی خۆم باش ئەناسم، دڵشکاوەو هیچیتر.. بەڵام خەتای خۆمە تێستیشت ئەکەم، ئەبووایە هەر زوو فەرامۆشتکەم.

هەستیی: نا تکایە ئەوەندە دڵت ناسک نەبێ.. باشە بەساقەوبم ئەوە من ئەچم، بەڵام بە کاکت بڵێ ڕێم لێ نەگرێ هەر شوێنێکم پشکنی و هەر پرسیارێکم کرد.

دەوران: باشە، هەر ئەم تێستەت ئەکەم.. گەر تاوانبارەکەت دۆزییەوە، بێ قەیدو شەرت قسەی دڵم ئەکەم، بەڵام گەر نەتدۆزییەوە، بیر لە من نەکەیتەوە.

# (( ئەڵقەی حەفتاو سێ))

هەستیی: تکایە بە هەر جۆرێکیتر تێستم ئەکەی بیکە، بەڵام ئەمە نا تکایە.. کچێ گیان من ئای تیم خوێندووە، نەک پەیمانگەی دادوەریی.. ڕەحمێ بە حاڵم بکە.

دەوران: ئەی نالێی ئامادەم سەریشم دابنێم لە پێناوتا؟ خۆ بەمە سەریشت دانانێی؟!

هەستیی: بەخوا قورسە.

دەوران: دەی دابەزە کەوایە.

دیمەنی – ١٥٣١ – ڕ/ ن – ماڵی خدرو تریفە، هەمان خانووی ماڵی هەڵشۆ، دیکۆر ئەگۆڕێ:

(( خدر خۆی ئەگۆڕێ و بۆینباخ ئەبەستێ، تریفە دێتە لایەوەو چاکەتی بۆ ئەگرێ))

تریفە: دەی با منیش بگەڕێمەوە بۆ ئۆفیسەکە!

خدر: چییە بێزار بووی لە چێشت لێنان هههه؟

تریفە: نەبەخوا، خۆشترین کاتم ئەو کاتەیە چێشت بۆ تۆ لێ ئەنێم، ئەزانی چەند چێژی هەیە، کە بە تاسەوە چاوەڕوانم بڵێی دەستخۆش جوان بوو؟

خدر: جا چێشتی تۆ هەر جوانە گیانی گیان.. هەرچیت لێناوە، پیاو دەست و دەمی پێوە ئەخوا.

تریفە: سوپاس.. بەڵام ئیتر جەو گۆڕینێکیش خۆشە، تۆ هەموو ڕۆژێک بایەکی باڵی خۆت ئەدەی، منیش هەر ماڵی دایکم.

خدر: من ئەچم سۆراخی سەلامەتیی هەموویان ئەکەم و دێمەوە.. مادام وای لێهات، ئێوارە خۆت سازکە ئەچین بۆ پیاسەو سینەماو چێشتخانەو شاری یاری.. بەدڵتە؟

تریفە: مادام لەگەڵ تۆیا ئەچم، هەر زۆر زۆر.. سەرم پێوە نییە!

خدر: سەرت خۆش بێ، قوربانتم باوانم.. ئەگەر ئەمرێکت هەبێ؟!

تریفە: من قوربانت، خەریک بوو بڵێم حەزت لە چییە بۆ ئێوارە؟ هههه

(( چوونە دەرەوەی خدرو خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١٥٣٢ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٥٢٨ - ڕ/ ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان بە ناو ژوورەکەدا دێت و ئەچێ قەلەقە))

دیدەوان: ئەرێ ئەوە چییان کرد؟ هەر نەهاتنەوە ماڵیان بە قورگیرێ! نازانن من لێرە بەسەر ئاگرەوەم؟

(( هەر دێت و ئەچێت و جاروبار پەردەی پەنجەرە لا ئەبا ))

________ گەڕانەوەی هەیە __________ Cut ______________

دیمەنی – ١٥٣٣ – ڕ / د – حەوشەی نەخۆشخانەی زوبێر:

(( ئامۆو دەوران و هەستیی وەستاون، چەند پیاو و ژنێکیش لەولاوە))

ئامۆ: باشە باش قبوڵمە.. بەڵام تۆ چی ئەزانی کاکە هەستیی؟ تۆیەک نە لێکۆڵینەوەت خوێندبێت و نە تەمەنێکی واشت هەبێ ئەزموندار بیت.

دەوران: گاڵتەت بە تواناکانی نەیەت کاکە، زۆر بلیمەتە.

هەستیی: من لە پێناوی ئامانجێکی لەوەی تۆش گەورەترا تێئەکۆشم بۆ ئەوەی بگەمە ئەنجامێکی پۆزەتیف.. من دیزاینەرم و هەوڵی خۆم ئەدەم.

ئامۆ(( بزە)): ئەبێ ئەو ئامانجە گەورەیە چی بێ؟ عاشق نەبی کورە؟!

دەوران: نا کاکە بە هەڵە لێی تێمەگە، کوڕێکی زۆر زیرەکەو حەز ئەکا ئەو شتەی دەستی ئەداتێ، بیگەیەنێتە ئەنجام.

ئامۆ(( بۆ یەکێ لە پیاوەکان)): کاک فەرهاد ئەم کوڕە ببەن هەرچی پێویست بوو بیخەنە بەردەستی.

فەرهاد: بەسەرچاو.. فەرموو کاکە.

(( هەستیی ئیزن وەرئەگرێت و ئەڕوا))

ئامۆ: گەوجت نەکردبێ چەتیو؟

دەوران: ئەو کوڕەیە کە ویستم شووی پێ بکەم و ڕاتگرت، سوپاست ئەکەم، ئەوەت فێر کردم، سوودی زۆرم لێ بینی.. ئێستا پێی بڵێم لەو سەربانەوە خۆت فڕێدە خوارەوە بە قسەم ئەکا.

ئامۆ: وتمان ئێوە هاوبەشی ژیانی یەک ئەبن، نەک هەرچی تۆ وتت ئەوە بێ.

دەوران: ئێ ێ ێ!!! منیش زۆرم خۆش ئەوێ، بەڵام با جارێ ئەو بە قسەم بکا هههە هەر هاتنەکەی هەموو شتێککی سەلماند، کە هیچیشی لێ نازانێ و دوای قسەم کەوت.

ئامۆ: وایە.. بەڵام نەرم و نیان بە ناشرین، دەرفەت نەقۆزیتەوە، خۆشەویستیی بکەن بە بنەما، نەک کامتان زاڵ بن بەسەر ئەویترا.

دەوران: خەمی منت نەبێ نە.. سوپاس بۆ تۆش کە ئێستا هەمووومان لێت ڕازیین و بە ڕاستی کاکی هەمووومان و کوڕە گەورەیماڵی.

ئامۆ: تۆش باش وریات کردمەوە شێت و وێت.. سوپاس.

(( دەست ئەکاتە ملی یان شانی ئەگرێ و پێکەوە ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٣٤ – ڕ / د – حەوشەی ماڵی گێلاس:

(( نینا لەسەر ڕۆشتنەو گێلاس بەڕێی ئەکا ))

نینا: بەخوا زۆرم پێ ناخۆشە پورە گێلاس، ئاوا لە کونی ژوورەوە خزاویت و نایەیتە دەرەوە.. توخوا بە قسەم بکە، وەک چۆن دیار چووەوە سەر دوکانەکە، تۆش بچۆو دەرگای ئوتێلەکە بە ڕووی خەڵکا بکەرەوە با نەشکێ.

گێلاس: جا با بشکێ نینا گیان.. تازە من ماڵ و موڵکم بۆچییە؟ هاکا منیش ڕۆژێک لار بوومەوە، ئەوەندەشمان بۆ کوڕو کچەکە بەجێهێشتووە لە سەرو بەریان زیاد بێ.

نینا: نا توخوا قەت وا مەڵێ، ئیشەڵڵا تەمەنت هەزار ساڵ بێ.. ئەی چی لێ ئەکەی؟

گێلاس: تۆزێ بێمەوە سەر خۆم، ئەیفرۆشمەوە.

نینا: ئەی تۆ لەولاش وا یەکێکی ترت هەستانۆتە سەرپێ.. ئەی ئەو چی؟

گێلاس: بەخوا تاقەتی هیچم نەماوە، ئەویش ئەفرۆشمەوە، هەروا بە هەیکەل.

نینا: دەی خوا بەڕەحمە، ئیشەڵڵا، ئەو بێتاقەتییە بەرت ئەدات و ئەگەڕێتەوە سەر ئیشەکانت و پڕۆژەکان تەواو ئەکەی.

گێلاس: جارێ هەر هیچ و دواتریش بزانم چۆن ئەبێ، ئەگەر هەروا بم، تۆو ئاوا هاوکارییەکم بکەن بۆ فرۆشتنەوەیان.

نینا: نا بەو هیوایەی وا نەبێ، با من بڕۆم بە یارمەتیت، دڵنیابە پێت لێ نابڕم پورێ گیان.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی ))

Cut

دیمەنی – ١٥٣٥ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر بەسەر عەرەبانەوە، نیگاریش دانیشتووە لەسەر قەنەفەو دوو دارشەقێکی ئەلەمنیۆم لە تەنیشتیەوە ))

زوبێر: بڵێم چی؟ ئیتر وا تێئەگەم.

نیگار: هەر لەسەری مناڵەکان بەدوور بێ، ئیتر هەرکەسێکەو هەر شتێکی لەدەست دێت با بیکا.

زوبێر: ئاخر ئەگەر کار وا بڕوا، لەسەری مناڵیش بە دوور نابێ.. ئەوە ئەگەر ئەو کابرا داماوە نەچووایە بۆ پاککردنەوەی ژوورەکەی و بەیانی ئامۆ خۆی دەرگای بکردایەتەوە، تیاچووبوو.. مەبەستم ئەوەیە تەڵەکە بۆ ئامۆ دانرابوو.

نیگار: جا ئامۆ پەیوەندیی بە هاوسەرگیریی من و تۆوە چییە؟

زوبێر: بۆ ئەوە کراوە، من توشی خەفەتی گەورە بکا، بەرگەی نەگرم و دڵم بوەستێ.. ئەی چۆن؟ ئەزانن کەوتوومەتە سەر عەرەبانەو کەچی بەوەش کۆڵم لێنادەن.

نیگار: ئەی کێ ناڵێ، کەسێک پێی خۆش نییە تۆ ئەو نەخۆشخانەیەت دانابێ و بیەوێ دەستی لێهەڵگری؟

زوبێر: هەی ئافەرین.. ئەوەش زۆر ڕێی تێ ئەچێ نیگە گیان.. ئەبێ کە ئامۆ هات قسەیەکی لێ بکەین، ڕاستە دەستخۆش.

نیگار: کارگەکەی منیش داخراوە.. نازانم بۆ بەجارێ ئەم هەموو بەڵایە؟

زوبێر: ئەبێ ئەویش چارەسەرکەین.

Cut

دیمەنی – ١٥٣٦ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن ))

نارەوەن: نا نا نا قەت وا مەڵێ خدر گیان، من لە خۆڕا قسە ناکەم.. دیدەوان ئەوەشی پێوتم کە شەنیا بە نیازی تۆڵە کردنەوەشە لە ئامۆ، چونکە ڕووی ناداتێ و پشتی تێکردووە.

خدر: توخوا ئەگەر دووبارە بە قسەیان تێبکەوی.. باوەڕم پێ بکە قسەی ڕاست چییە؟ نییانە.. هەموو درۆزن و کەڵەکبازو پیلانگێڕن.

نارەوەن: جا ئەو چوزانێ دڵیان بەیەکەوە بووە؟ تا ئەوە بڵێ.

خدر: بزانە لە کێی بیستووەو ئەو چیرۆکەی بۆ تۆ ڕێکخستووە؟

نارەوەن: ئەی گڕ تێبەردانی ژووری ئامۆ بە نیازی کوشتنی نەبوون گوێی شەیتان کەڕ بێ.؟

خدر: بەڵێ ئەوە ڕاستە کە بە نیازی ئەوە بوون، با لێکۆڵینەوە بەردەوام بێ، ئەگەنە دەرئەنجامێک، پەلە مەکە.. بەڕاستیی من هەر بە دەسیسەی دیدەوانی ئەزانم.

نارەوەن: دەی منیش دڵنیات ئەکەم ئیشی شەنیایەو ماویشە، هیچ خۆی نەسوتاندووە.

خدر: وا گۆڕەکەی هەڵئەدەنەوەو پشکنینی دی ئێن ئەی بۆ ئەکەن.. ئەوسا هیچ گومانت نامێنێ.

نارەوەن: سەد دی ئێن ئەی بۆ بکەن و بڵێن شەنیایە، من هەر ئەڵێم ئەو نییە.

خدر: ئەی چارەسەری قەناعەتی تۆ چییە؟ ئەوە بۆت دەرکەوت جاری پێشوو من و کاک ڕاهۆز باشتر تێی گەیشتبووین.. هەر بە قسەشت نەکردین.. ئەی ئەمجارە؟

نارەوەن: من باشتر تێی گەیشتووم. ________________ Cut _________

دیمەنی – ١٥٣٧ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٥٣٢ – ژووری تەنیشتی سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان هەر هات و چۆیەتی و لە پڕ دەنگی هاواری ژنێک دێت و ساماڵ خۆی ئەکا بە ژوورا ))

ساماڵ: هێنامان کاک دیدەوان!

دیدەوان: کامیان؟

ساماڵ: ئەوانی لێ نەبوون، هەر ژنێکی گەنجی لێ بوو، لەسەر فرمانی خۆت لەوێوە بە قژ ڕاکێشان هێنامان.

دیدەوان: ئەک سەری ئاژدادتان لە قوڕنێن باشە؟ من وتم ئەوان بێنن یان هەر کەسێکی لێ بو بیهێنن.. هێناتان بۆ ئەوەی شوێنەکە شارەزابێ گەماڵباوک؟

ساماڵ: نا قوربان چاویمان بەستبووەوە.. وتمان سەرچڵ بۆچی دێت بۆ ئێرە؟ وتی پوورزامە، جاروبار سەردانمان ئەکا.

دیدەوان: ئەوەشتان وت؟ دەک بەخێر نەیەنەوە، ئەی بیرتان لەوە نەکردەوە چۆن لە شەقی سەرچڵ ڕزگارتان ئەبێ؟

ڕەوەز(( دێتە ژوورەوە )): کەس حەددی نییە شەقمان تێهەڵبدا، سەرچڵ خوێڕی کوێیە؟

دیدەوان: ئەی کە خزمەکەی بە قژ ڕاکێشان بفڕێنن، دێت پاداشتتان ئەکا؟ مەگەر ئێوە نازانن سەرچڵ چ پیاوکوژێکە؟

ڕەوەز: بۆ خەڵکی بێ چەک بەڵێ، بەڵام بۆ ئێمەو مانان ئەو پیاوە نییە.

دیدەوان: بڕۆ ساماڵ بڕۆ دڵی ئەو ژنە چاککەن و پارەیەکی باشی بدەنێ سەرچڵ لەو وەزعە تێ نەگەیەنێ، بڵێ بە هەڵەداچوو بووین.

ڕەوەز: جا پێویست بەو ڕیاییە ئەکا بۆ سەرچڵ؟

دیدەوان: ئەوە ڕیایی نییە بێ ئەقڵ! ئەڵێم با کەسیترم لە دەست نەچێ، هەر لە یەکتر هەڵبەزنەوە، یەکێکتانم لە کیس ئەچێ.

ڕەوەز: دەی باشە، بەڵام من ئەو ڕیاییە ناکەم، با ئەوانیتر بیبەنەوە.

(( چوونە دەرەوەی ساماڵ بەخێرایی و ڕەوەز بە باڵ فش کردنەوەو خاو))

Cut

دیمەنی – ١٥٣٨ – ڕ- لای ئێوارە / د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ چاخانەکەی کۆئەکاتەوەو داییخات، تەنها لەتیف دانیشتووە))

لەتیف: دەی با منیش هەستم، هیچت پێویست نییە باوکە؟

هاوڕێ: نا مام لەتیف گیان هەر خۆشیت.. بەڵام ئەو کابرایەی هاتە لاتەوە، ئەتناسی؟

لەتیف: نەء، یەکەمجارم بوو بیبینم.

هاوڕێ: باسی چی ئەکرد؟

لەتیف: هەر ویستی چایەک بخواتەوە، هەر شتی ئاسایی باسکرا، بۆ؟ کوڕم؟

هاوڕێ: غەریب بوو بەم دەوروبەرە، هەروا پرسیارم کرد.

لەتیف: نا.. نا.. منیش ئەگەر بمزانیایە بەجۆرێکە، یەکێکتانم بانگ ئەکردە لای خۆمەوە.

هاوڕێ: باشە ماڵت ئاوا بێ (( لەتیف ئەڕوا)) خوات لەگەڵ مام لەتیف گیان.

(( لەتیف وەڵامی ئەداتەوەو ئەڕوات.. دوای لەتیف، هاوڕێ کە تەواو شتەکانی کۆ نەکردۆتەوە، بە پەلە ئەڕوات و ئەو دەوروبەرە ئەپشکنێ کە کەسێک دانیشتبێ و نامەیەک ئەدۆزێتەوە لە سەری نوسراوە، بۆ کاک حەمەخدری بەڕێز.. بە پەلە مۆبایل دەرئەهێنێت و پەیوەندی بە خدرەوە ئەکا))

هاوڕێ (( بە مۆبایل، دوای سڵاو)): قوربان گیان نامەیەکیتریشت بۆ دانراوە.

خدر(( دەنگ)): دەستخۆش.. کابرات نەئەناسی؟

هاوڕێ: خەمت نەبێ قوربان، هەر کە هات سەروفەسساڵیم بەدڵ نەبوو، یەک دوو ڕەسمی جوانیم بۆ گرتی، ئەوەندە سەرقاڵ بوو هەر هەستیشی پێ نەکرد.

خدر: زۆر دەستخۆش هاوڕێ گیان سوپاس.. ئەرک نەبێ بۆم بێنی بۆ ماڵەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٣٩ – ش/ ن –ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن و تافان و باڵاو کڵێپە))

هەندرێن: پێتەوە دیارە.. گوڵم، خۆ بە نکوڵی کردنی تۆ نابێ.

تافان: باوەڕ بکە هیچ شک نابەم هەندرێن گیان.. وەک سەرەتای نەخۆشییەکم بێ وایە، سەرم جاروبار گێژ ئەخواو کەمێک بێتاقەت ئەبم، هیچ نییە.

هەندرێن: کچێ تۆ جاران کەی وابوویت؟ هەموو ئێوارەیەک ئەبووایە نارەوەن خان داگریتەوە.

تافان: ئۆی دە چی لێبکەم توخوا؟ ئەو بەڕێی خۆی و ئێمەش بەڕێی خۆمان.

هەندرێن: جا بەرازت ببینیایەو من نا، هەموو شەوێک ئەکشنێک ڕووی ئەدا، کەچی ئێستا بووم بە هەندرێن گیان، جا کە هەستت بکردایە خەریکە نەخۆشییەک بگری، پەنجا دکتۆرت ئەکرد، پێش ئەوەی نیشانەکانی دەرکەوێ.. نازانم زۆر شت گۆڕاوە لەم ماڵەیا.

تافان: جا خراپە؟

هەندرێن: نا نەوەڵا، هەر زۆر باشە.. تۆ جاران کەی یارییت لەگەڵ مناڵ ئەکرد، ئەوە لە ئێوارەوە ئاگام لێیە دوو سێ جار مناڵ پێت ئەڵێن دایکە با چاوشارکێکەمان بکەینەوە.

باڵا: دە ئیتر حەزمان لێیە، تۆ یەیتەوەو ئیتر هەر ئەبێ خەریکی تۆ بێ.

کڵێپە: هەستە دایکە هەستە.

تافان(( خەندە)): من نەمتوانی ئەوان بگۆڕم، ئەوان منیان بردە سەر ڕێی خۆیان هههه.. یەڵڵا دەی.

(( چاوشارکێ ئەکەن و هەندرێنیش بە خۆشحاڵییەوە سەیریان ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٥٤٠ – ش/ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان و ڕەوەزو زاهیدو ساماڵ))

دیدەوان: ئەگەری دوورخستنەوەی حمەخدریش لە ئێمە هەیە چاک بزانن.. شەنیا هەول بۆ ئەویش ئەدا.

زاهید: سەرچڵیش دیار نییە.

دیدەوان: لە دوای ئەوەوە کە باسی گومانەکەمان کرد، نەهاتۆتەوە.. ئەوەش بەڵگەیەکیتر کە شەنیا زیندووە.

ڕەوەز: نا ڕەنگە دڵی شکابێ لەوەی گومانی لێ ئەکەیت و کێ ناڵێ خزمەکەشی پێی نەوتووە چی بەسەرهاتووە.

دیدەوان: لە هەموو بارێکدا، چاوەڕوانی ئەوە مەبن سەرچڵ لە ڕیزی ئێمەدا مابێتەوە.. ئەومان لە دەستچوو، خۆشتانی لێ بەدوور بگرن.. ئەو دۆستایەتیی و هاوڕێیەتی ناخوێنێتەوە.

ڕەوەز: جا ئێمەش وەکو ئەو.

دیدەوان: من نامەوێ کەسێکی تریشم لە دەست بچێ.. ئەوە ئەو ژنەی هاوڕێکەی ڕێشار گەڕاوەتەوەو ناوێرێ..........

ڕەوەز: چی لێ بکەین؟ بیکوژین؟

دیدەوان: نە بابە چاوی دەرئەهات، ئەو خواخوایەتی ئێمە ئاشکرای نەکەین.. ئێ.. ئەوە دڵنیاش چۆتە پاڵ ئەوان، گوڵزاریشمان فت.. کەواتە ژنمان بەدەستەوە نەماوە، بۆ ئەو جۆرە ئیشە خێرایانە.. سەرچڵیش ڕۆشت و ئەی چووزانم هەر ئەوەندە ماون.

ساماڵ: جا ئیش وا ئەکرێ؟

زاهید: بە تەنهاش بم ئەیکەم.

دیدەوان: مۆڵەتم بدەن با بۆ سبەی شەو تەواو شتێک گەڵاڵە بکەم.. یان دەست لەو ئیشە هەڵگرین، یان.... نازانم.

ڕەووەز: ئەی خدرەکەش فت؟

دیدەوان: بەیانی چاوەڕێی بینینی من ئەکا،.. ئەویش پێ ئەچێ کەسێکیتر چووبێتە بن کلێشەیەوە.. ، ئەوەندەیتر مەرج قورس ئەکا، ئەگەر وابێ؟ خۆی داوای بینینی کردم... با بزانم چۆن ئەبێ.

زاهید: هەر بەو مەرجە کۆنانەی خۆت بۆت داناوە، وا بچۆرەوە پێشەوە، نەیکرد.. ئەویش چاوی دەرئاهات.

دیدەوان: نا.. کلکی لە ژێر دەستمایە، وێنەکانی ژنی ژنبراکەیم لایە.

Cut

دیمەنی – ١٥٤١ – ش/ د – بەردەرگای ماڵی تریفە:

(( هاوڕێ و حمە خدر بە جلی ماڵەوە لەبەردەرگان))

هاوڕێ(( مۆبایلی بەدەستەوەیە)): ئەوە وێنەکەشیم نارد بۆ ڤاییبەرەکەت.

خدر(( نامەکەی بەدەستەوەیە)): دەستتخۆش هاوڕێ گیان، نانی ئێوارە لێرە بخۆ، فەرموو.

هاوڕێ: نەبەخوا زۆرم پەلەیە کاکە حمەخدر گیان.

خدر: دەی خوات لەگەڵ، ئاگات لەخۆت بێ، برا.

هاوڕێ: زۆر سوپاس، خواحافیز.

(( خدر دێتە بەر ڕوناکیی و نامەکە ئەخوێنێتەوە))

ساماڵ(( مۆبایلەکە وەرئەگرێ)): بەسەرچاو. (( پاش کەمێک ئەیدۆزێتەوە)) ئەوەتا.

(( بەڕێز کاک حەمە خدر.. ئێمە جەنابتمان وەک پیاوێکی باش دیاریکردووە، بۆ ئەوەی ئیشێکی گەورە بە یەکەوە بکەین، کە داهاتەکەی چەندین ملیۆن دۆلارەو پشکی شێریش بەر جەنابت ئەکەوێ.. ئەگەر جەنابت بە هەر کارێکیترەوە سەرقاڵیت، ئەوا کات تێئەپەڕێ.. ئەگەر بە نیازی کارەکەشیت، لەو شوێنەی نامەکەت بۆ دانرابوو، سێ کارتۆن ئاوی جام لەسەریەک دابنێ، وەک نیشانەی ڕەزامەندیت.. ئەوکاتە بە جۆرێکیتر پەیوەندیت پێوە ئەکەین.. ماوەی وەڵامدانەوەت ٢٤ کاژێرە))

Cut

دیمەنی – ١٥٤٢ – ش/ن – ماڵی تازەی باوکی خدر:

(( غەمگین و سەلوا تەماشای تیڤی ئەکەن و باوک لە ژوورێک دێتە دەرەوە))

باوک: خەوم لێ ناکەوێ، هەر بیرم لای ئەم زیندانە نەعلەتیەیە.. بەخوا ئاوا نازیم، نەبەخوا، خەریکە ئەو دڵەم ئەتەقێ.

هەرمێ: باوەگیان وەرە خۆت بە تەلەفیزۆنەکەوە مەغشوڵکە، بیرت ئەچێتەوە.

باوک: بەڵامدا لە تەلەفیزۆنیش.. لێم مەگرن ئەگەر بینیتان شێت بووم.

غەمگین: ئەی بگەڕێینەوە؟

باوک: ئەرەوەڵا ئەگەر حمەخدر بەقسەم بکا، یەک و سەت باشترە.

هەرمێ: دەوەڵا پێی بڵێ باوە گیان، بەڵکو سا ئەمە خوایە ڕازیی بێ.

باوک(( بە دەنگی بەرز، بانگی پاسەوانەکەیان ئەکا)): بەختیار، کوڕم بەختیار.

Cut

دیمەنی – ١٥٤٣ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و خدر))

خدر: کاک ڕاهۆز ئەڵێ پێی بڵێین، با شێتگیر بێ.

نارەوەن: منیش ئەوەم پێخۆشە.. چونکە ئیتر دیدەوان ورد ئەگەڕێ بە شوێنیاو بۆمان ئەدۆزێتەوە.

خدر: پێمخۆشە قسەکەی تۆ دەرچێ، یارییەکە گەرمتر ئەبێ، هههە.

نارەوەن: جا با گەرمتر بێ، ئەزانی ئەم ئیشە ئەوەندە خۆش بووە، حەزم بۆ کۆتاییەکەیەتی، بزانم چی ڕووئەدا.

خدر: ئەمە فیلم نییە نارەخان.. کێ ناڵێ پێش کۆتایی من و تۆ تیا ناچین؟

نارەوەن: بڵێم چی؟ بیرم لەوە نەکردبۆوە هههە، وامئەزانی ئەبێ هەر بمێنین.

Cut

دیمەنی – ١٥٤٤ – ڕ / ن – چاپخانەی تیرۆژ:

(( هەستیی و ئامۆو تیرۆژو دەوران.. ئامۆ تەماشای چەند وێنەیەک ئەکات))

هەستیی: لێی تێگەیشتی یان بتبەمە سەر شوێنەکە؟

ئامۆ: زۆر ڕوونە.. لە پشتەوە کونێکی کردۆتە پی ڤی سییەکەو قەپاغیشی بۆ کردووە، ئەوەتا.. لەمەیانا بەو شیشەی ڕاکێشراوە بۆ کونەکە، گیرەی پەنجەرەکە هەڵئەگیرێ و پەنجەرە ئەکرێتەوە.. واو دەستخۆش هەستی گیان، خۆم بە پۆلیسیشم وت دەستی ئەو کەسەی تیایە کە دەرگای بۆ دروست کردووین، کەچی پەنجەرەکە دەرچوو، هەی ئافەرین.

هەستیی: کە وتت لە کامێرای چاودێرییەوە دیارە کەس نەچۆتە ژوورەوە، خەیاڵم بۆ دوو شت چوو.. یەکەم جوڵەی کامێراکە ڕاگیرابێ، ئەوەم زووتر پشکنی، دووەمیش پەنجەرەو هەرچی لەزگەی پێوە بوو سەرەتا لێم کردەوە، تا ئەوەم بینی.

تیرۆژ: دەستخۆش، هەرچەندە لە هیچیش تێ نەگەیشتم.

ئامۆ(( بە وێنەکانەوە ئەچێتە لای دەوران و تیرۆژەوە)): ئەم بڕاوییە ئەبینی لە خوار دەسکی پەنجەرەکەوە؟

تیرۆژ: بەڵێ.

ئامۆ(( لە وێنەیەکیتردا)): ئەوەتا قەپاغەو دەرئەکرێ.

دەوران: وایە.

ئامۆ: لەم وێنەیەدا شیشیشێک دیارە لەبنەوە.. سەیری ئەم وێنەیەی تر بکەن، کە ئەیسوڕێنی، شیشەکە دەسکی هەیە، پاڵی پێوە ئەنێیت، ئەو گیرەیەی یەدەکەی گرتووە بەرز ئەبێتەوەو ئیتر پەنجەرەکە ئەکرێتەوە.

دەروان: ئەوە چ فێڵبازێک داینائوە، هەڵبەت هەر کە داینائوە، بە نیازی ئەمە بووە.

ئامۆ: بە دڵنیایی وایە، ڕەنگە بۆ ژووری کاک زوبێریش ئەمە دروست کرابێ.. تا ئەویش یەکێکی پێوە نەبووە، بچم ئەم وێنانە بدەم بە پۆلیس و هەموو دەرگاو پەنجەرەکانیش بگۆڕین.. دەستخۆش هەستیی گیان ئەتبینمەوە بەساقە.

هەستی: خوات لەگەڵ (( ئامۆ ئەڕواو بۆ دەوران)) وتت چی؟ دەی قسەی دڵت بکە، بردمەوە.

دەوران: نازانم، ڕەنگە ئێستا هیچ هەستێکم نەبێ بۆ تۆ.. با تا عەسر بزانین چۆن ئەبێ؟

تیرۆژ(( تریقەو پێکەنین)): بە دڵمە.. دایکم زوو زوو ئەڵێ تا جۆزەردان، پاشا گەردان.. تا عەسریش دنیا بە هەزار جۆر ئەگۆڕێ (( چەپڵەیەک بۆ دەوران)) هەی دەستخۆش.

دەوران: ئیتر دڵی من ئاوایە، جاری وا هەیە زۆر درەنگ بڕیار ئەدەم و جاری واش هەیە، دەستوبردی تیا ئەکەم.

هەستیی: سوپاس بۆ ڕابواردنەکەت دەوران خان (( هەڵئەسێ)).

دەوران: دانیشە، لوتەلاییت لێ نایە باوانم.. خەمت نەبێ تۆزێ خۆت شیرین کرد.. تا عەسریش بزانم تێستێکیترت ناکەم؟

هەستیی: تەواو، وتت هەر ئەمە.

دەوران: پەلەت چییە مردووت مرێ؟ ئەها ئەوە عەسرە هههە.

هەستیی: تا عەسریش بۆ تۆ چاوەکەم.

تیرۆژ: بەس بەخوا زۆر زیرەکانە دۆزیتەوە، ئافەرین.

دەوران: ئەی نەتبیستووە عەشق مەحاڵ ئەخولقێنێ؟ هاهاها.

Cut

دیمەنی – ١٥٤٥ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو پاشان ئاری دێتە ژوورەوە فایلێکی پێیە))

ئاری: گەورەم دادوەر بە پێی ماددەی ٧١ ی بنەما سزاییەکان، فەرمانی دەرکردووە بە هەڵدانەوەی گۆڕەکەی شەنیاو خۆیشی ئامادە ئەبێت.

بەهێز: دەستخۆش.. کاتەکەی دیاری نەکردووە؟

ئاری: بەڵێ، سەعات ١٢ .. ئاگادارکردنەوەی پزیشکی پسپۆڕیش.. یان پسپۆڕی دی ئێن ئەی.

بەهێز: مولازم ئاری، ئێستا لەگەڵ مەفرەزەیەکا بچن و بە وردیی پاشماوەی ژوورەکە بگەڕێن، هەر شتێکتان بەرچاو کەوت بیهێنن بەڵکو سوودی هەبێ و ئەو گۆڕ هەڵدانەوەیە نەکرێ.. ئەوەندە خۆش نییە.

ئاری: فەرمانتە گەورەم.

(( ئاری چوونە دەرەوەو تحية))

Cut

دیمەنی – ١٥٤٦ –ڕ/ن –ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو دیدەوان و نارەوەن))

دیدەوان: کاک حەمە خدر سێ کارتۆنە ئاوەکەی لەو شوێنە بۆ دانێ، با بیبینن.. ئیشی تۆ تەنها دۆزینەوەی شوێنی ئەم گروپەیە.. ئەوەم بۆ بکەو هیچیتر.

خدر: جا بۆچی بۆ تۆی بکەم کاک دیدەوان؟ وەک باسی ئەکەن سەرمایەیەکی گەورەم دەست ئەکەوێ، بۆ پێت بڵێم و ئەوە لە دەست خۆم بدەم؟

دیدەوان: ئەوە فەرمانی منە کاکە، لێت نەشێوابێ، ئێمە بەرنامەی خۆمان هەیەو تەنها سەرۆک فەرمان دەرئەکا، ناکرێ هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە فەرماندە بێ، وابزانم لەسەر ئەوەش ڕێککەوتووین.

خدر: هەرگیز لەسەر ئەوە ڕێک نەکەوتووین من خزمەتکارت بم، خزمەتکاریی کەسیشم قبوڵ نەکردووە.

دیدەوان(( هەڵئەسێ)): تۆ زەرەر ئەکەی کاکە، من نا.. وا نەزانی وێنەکانیشم هەموو سڕیوەتەوە؟ لەسەر ئەم مۆبایلەو لە کۆمپیوتەرەکەشما هەیە باوە گیان.

خدر: ئەوپەڕەکەی ئەچی بە عەمموودا هەڵی ئەواسی، چیت لەدەست دێ بیکە.

نارەوەن(( تفێکی تێ ئەکا)): تفوو بێغیرەت، شەرت بێ یەک وێنەی ئەو بووکەم بڵاوبێتەوە، بە دەستی خۆم بتکوژم.

دیدەوان: دەمانچەکەت فیشەکی بخەرە بەر، چونکە نیو سەعاتیتر ئەیبینی.

نارەوەن: دەی ئەوە من و ئەوەش تۆ کارخانەچی!

(( دیدەوان بە پێکەنینەوە ئەچێتە دەرەوە))

نارەوەن: خۆ گوێت لەو بێ ئابڕووە بوو؟

خدر: تۆ بۆچی خۆت سەغڵەت ئەکەی؟ ئەی پێمنەوتی هیچی لانەماوە.. دیارە چێکی نەکردۆتەوە هەھە.

نارەوەن: ئەی چی ئەکەی بۆ گروپە تازەکە؟

خدر: قسەکەی تۆیە، گومانی زۆر هەیە لە زیندوویێتیی شەنیا.. زۆر پێ ئەچێ دیدەوان ڕاست بکا، شەنیای لە پشتەوە بێ.. ئێستا بە هاوڕێ ئەڵێم ٣ کارتۆنە ئاوەکە دابنێ.

نارەوەن: هههه بەخوا تۆش سەربەگۆبەنی!!!

خدر: ئەی ئیشەکەمان ئەوەیە چی بکەین؟ (( بە سوکە پێکەنینەوە ئەچێتە دەرەوە))

نارەوەن: خوای گەورە بێ ئافات بێ و لەم ئیشەشدا سەرکەوتوومانکەیت.

Cut

دیمەنی – ١٥٤٧ – ڕ / د – نەخۆشخانەی زوبێر – پشتەوەی ژووری ئامۆ:

Mute

(( قەرەباڵغیی پۆلیس و ئامۆو چەند کەسێک لە پشتەوەی ژوورەکەی ئامۆو هەستیی دیارن، ئامـاژەی لێواری پەنجەرەکان ئەکەن.. وردەکاریی پەنجەرەکان نیشان نادرێت))

Cut

دیمەنی – ١٥٤٨ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( شەنیا ٢ بە قژی ڕەشەوە، عەینەکی گەورە لە چاویا، تحدیدو قەڵەمی لێوی جیاواز، بە هەندێک گۆڕانکاریترەوە دێتە لای هاوڕێ، دڵەش دانیشتووە))

شەنیا ٢: ئەوە ئەگەر کچێک بیەوێ چا بخواتەوە ئاساییە؟

هاوڕێ: هەر زۆر ئاساییە خوشکەکەم فەرموو دانیشە.

شەنیا ٢: وامزانی ئەو کارتۆنانە بۆ ئەوە دانراون کەس دانەنیشێ، چایخانەکەشت ساردو سڕە.

هاوڕێ: ئەم کاتانە خەڵک بە ئیشەوە خەریکن ئەبێ خۆم بیبەمە خزمەتیان، ئەوە هی ئەوەیە.

شەنیا ٢: با بێمە لای ئەم کوڕە باشەوە، سڵاو.

دڵە: سەرچاو بەقوربان، فەرموو فەرموو.

شەنیا ٢: دە چایەکی ڕوون ڕوونم بدەرێ زەحمەت نەبێ.

هاوڕێ: وەی بانی دیەم.

شەنیا ٢(( بۆ دڵە)): تۆ هەروا شەرمنی کاکە؟ ناوەکەشتم نەزانی.

دڵە: ناوم دڵشادە، کوا شەرمنم؟

شەنیا ٢(( دەست ئەگرێ بە دەمییەوەو پێ ئەکەنێ)): ئەی لەوە شەرمنتر چی؟ کوڕی ئێستاو لەو تەمەنەی تۆیا هەر کە چاوی بە کچێک ئەکەوێ، ئیتر ئەڵێی کەڵەشێرە دەوروخولی ئەدا.

دڵە: هەموو شتێ بە ئسوڵی خۆی جوانە.. منیش حەزم بە کچی جوانی وەکو جەنابت هەیە، بەڵام خوا ئەیزانێ تۆش پەیوەستی بە کەسیترەوە، یان نا؟ (( هاوڕێ دیقەت ئەدا))

شەنیا ٢: ئۆو یەعنی هەر بەو خێراییە سووکە حەزێکت لێکردم هاهاها.

دڵە: نا نا ببورە مەبەستم ئەوە نەبوو.

هاوڕێ(( چایەکەی بۆ دائەنێت و چایەکی تریشی پێیە)): فەرموو دادەگیان.

شەنیا ٢: من وتم چایەک، ئەوە بۆ دووانت هێنا؟

هاوڕێ: ئەوە بۆ ئەو ئۆفیسەیە داوایان کرد بۆیان ئەبەم.

دڵە: کوا کەس داوای چای نەکرد، ئێستا کاک حەمە خدر خۆی لێرە نەبوو؟

هاوڕێ: ئەی خۆ شێت نەبووم لە خۆمەوە چای بۆ ببەم؟ داوای لە خۆم کرد. (( بەرەو ئۆفیس ئەچێت و شەنیا ٢ چاکەی ناخواتەوەو نامەیەک لە پشتی دڵەوە جێئەهێڵێت و هەڵئەسێت))

شەنیا ٢: ببورە چاوەکەم پەلەمە ئەبێ بڕۆم، ئەتبینمەوە. (( تەکسیەک لەسەر شەقامەکە دێتە بەردەمی و دەرئەچێ.. پاش کەمێک خدر دێت، ئەگەڕێن شەنیا ٢ دیار نییە))

خدر: ئەو کچە چی لێهات؟

دڵە: سواری تەکسی بوو ڕۆشت، بۆ؟

خدر(( لەگەڵ دیالۆگدا دەوروبەری ئەگەڕێ و نامەکە ئەدۆزێتەوە)): ئا تۆ بجوڵێ، هەستە دەی.. ئای خوایە ئەم هەموو دەبەنگە چییە لە من کۆبوونەتەوە؟ خۆ هیچیان ئاگایان لە قنگی خۆیان نییە. (( بەرەو ئۆفیس ئەگەڕێتەوەو نامەکە ئەکاتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٤٩ – ڕ / د – غازفرۆشی عارف:

(( عارف و دیدەوان))

دیدەوان: سەیارەم ناوێ قەبری بابی سەیارەش، من خەریکە خەفەت ئەمکوژێ.

عارف: ئەی وایە، خۆ پەیاکردنی ئەم جۆرە پارانە هەوانتە نییە..خەفەتیشی تیایەو مەترسیی زۆریش.

دیدەوان: ئەم گەنج و منداڵ و تواڵە خەریکە بەڕەکە لەژێر پێمان دەرئەهێنن.

عارف: ئەمجارەیان کێ؟

دیدەوان: خدرەفەنیشمان لێ هەڵگەڕایەوەو دادە نارەوەنەکەشم هەڕەشەی کوشتنم لێ ئەکا.. دە دیدەوان مەمرەو زیاتریش ببینە.

عارف: ئەو بۆ هەڕەشە ئەکا؟ خۆ بە حساب شووی پێ ئەکردی.. سەیرەبێ بڵێ بۆ نامهێنی؟ هاهاها.

دیدەوان: نە بابە ئەگەر ڕەسمەکانی بوکەکەی بڵاو بکەمەوە؟!

عارف: من ئەو ڕەسمانەم هەر نەبینیوە، ئەوەندە گرنگە بڵاوی بکەیتەوە بتکوژێ؟

دیدەوان: کورە دەمارم گرتوون، ها ببینەو بزانە چۆن دەمار گرتنێکە؟

عارف: ئادەی؟

دیدەوان(( مۆبایل دەرئەهێنێ و ئەگەڕێت و نایبینێتەوە)): بە زاتی خوا سڕاوەتەوە، ئەی هاوار جا هەر ئەوە چەکی دەستم بوو.. خوا بکا لە کۆمپیوتەرەکەیا مابێ.

عارف: مۆبایلت هەر بە خۆتە کێ ئەیسڕێتەوە؟ جوان نەگەڕاوی!

دیدەوان: کورە چی جوان نەگەڕاوم؟ بە زات و سیفەتی خوا ئەویش یەکێکی هەیە لەناومانا، من مردوو و تۆ زیندوو بزانە لە کۆمپیوتەرەکەشا سڕاوەتەوە یان نا؟

عارف: بە چیبیا وا دڵنیای؟

دیدەوان: کورە من لەو ژوورە جاروبار مۆبایل دائەنێم و هەر جارەو یەکێکیش لەسەر کۆمپیوتەرەکەیە، جا ئیتر بۆ پێشاوێ شتێ چووبێتمە دەرەوەو زەفەریان پێ هێنابێ، ئەوە کۆمپیوتەرەکە هەر لێگەڕێ.. ئا ئا، نازانم تۆ لەوێ بووی یان نا ڕەوەز وتی لای من بووایە بە عەمموودا هەڵم ئەواسی.

عارف: ئێی.

دیدەوان: خدرەکە ڕێک وتی حەز ئەکەی بچۆ بە عەمودا هەڵیواسە.. کەواتە دڵنیایە هیچم لا نەماوە، بۆیە وا بێ منەتە! ئەی چۆن زانی ڕەوەز وتی لای من بووایە بە عەمموودا هەڵمئەواسی؟ بەزات و سیفەتی خوا، یەکێکی لای ئێمە چاندووە.. ئەگینا چۆن هەمان قسەی ڕەوەز ئەکاتەوە؟

عارف: ڕێی تێ ئەچێ، جا ئەبێ ئەو کەسە کێ بێ؟

دیدەوان: هیچ شتێ لە دەستی دیدەوان دەرناچێ، پەلەم لێ مەکە.

عارف: ئەرێ سا وەڵڵاهی هەر شتەو لە دەستی تۆ دەرئەچێت و ناگەڕێتەوە. بۆ ئەوەندە لەخۆڕازیت برا؟

دیدەوان: دەی ئینجا نۆرەی تۆیە، هەر تۆ مابووی لێم هەڵگەڕێیتەوە؟

Cut

دیمەنی – ١٥٥٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدر بەدەم خوێندنەوەی نامەکەوە دێتە ژوورەوە))

نارەوەن: ئەمجارەیان چی؟ هەر نەتبینی؟

خدر(( نامەکە تەواو ئەکا)): نا ڕۆشتبوو، ئەمەشی خستبووە ژێر کورسییەکەی دڵە.

نارەوەن(( دەست ڕائەکێشێ لێی وەرگرێ)): ئادەی بزانم!

خدر: ئەڵێ .. (( نامەکە ئەخوێنێتەوە)) تا دیدەوانت لا بوو، کارتۆنەکانت دانەنا، دوای ڕۆشتنی ئەو داتنا، کەواتە دیدەوان پێی وتووی شوێنی ئێمەی بۆ بدۆزیتەوە.. لە تۆڵەی ئەو ناپاکییەتدا کە دیدەوانت تێگەیاند، زەبرێکی قورست لێ ئەدەم هەی ناپاک. (( نامەکە قەد ئەکاتەوەو ئەیخاتە گیرفانی)) هەر ئەم مابوو هەڕەشەمان لێ بکا هههە.

نارەوەن: چاویان دەرئەهات، تۆ لە هاتن و چوونتا وریای خۆت بە!

خدر: من خەمی ئێوەمە، زەبری قورس ئیتر هەر ئێوەو ماڵی باوکمن.. هەڕەشەکە لە خۆم نییە.. زۆر دوور نییە ئەو کچەی نامەکەی داناوە شەنیا نەبووبێ.. چییە من بتوانم ڕوخساری خۆم بگۆڕم، ئەو بۆ نا؟

نارەوەن: کورە چۆن خۆی ئەخاتە مەترسییەوە؟ پارەی هەیەو یەکێ لە بەکرێگیراوەکانی ئەنێرێ.

Cut

دیمەنی – ١٥٥١ – ڕ / ن / ژووری بەهێز:

(( پاوانەیەکی ئاڵتونی سوتاو لەناو نایلۆنێکدا لەسەر مێزەکەیە))

ئاری: بەڵێ زۆر ڕاستە، کێ نالّی پاوانەی کچەکەی ئەوان نییە.

بەهێز: پەیوەندییەک بە براکەیەوە بکە، بڵێ لە دایکی بپرسن بزانن پاوانەی بە قاچەوە بووە یان نا؟.. بڵێ کەمتر لە چارەکێکتان لەبەردەستتایە وەڵاممان بدەنەوە.

ئاری: گەورەم بۆ چارەکێک؟

بەهێز: تا ئەگەر هی کچی ئەوانە فریای دادوەر بکەوین و گۆڕەکە هەڵنەدەینەوە، چونکە بەڵگەی تازەمان دەست کەوتووە.

ئاری: تەواوە، بەڵێ فەرمانتە هەر ئێستا.

(( ئاری تەلەفون ئەکا))

Cut

دیمەنی – ١٥٥٢ – ش / ن – ژووری تەنیشت سجنی دیدەوان:

(( دیدەوان دانیشتووە، لەبەرخۆیەوە دایالۆگ))

دیدەوان: دیدەوان جا بۆ نامری ژنێک تفت تێ بکا، لەناو ماڵەکەتدا سیخوڕی تیابێ، جا خوا ئەزانێ سەر بەکێیەو نەشزانی کێیە.. ژنێکی پیسی وەک تافان بە قسەت نەکات و هەر ڕۆژەی پەلێکت هەڵوەرێ؟ تۆ بڵێی ڕاست بێ کە ئەڵێن گورگ پیر بوو ئەبێ بە مەخسەرەی سەگ؟ ئەی ئەوە نییە؟!

زاهید(( بەپەلە خۆی ئەکا بە ژووراو قۆڵێکی خوێنی لێ ئەتکێ)): کاک دیدەوان فریامکەوە، خوێنم زۆر لەبەررۆشتووە.

# (( ئەڵقەی حەفتاو چوار))

دیدەوان(( ترس)): ئەوە چییە زاهید کێ وایلێکردووی کاکە؟

زاهید: تۆ خێرا لۆکەو لەفافم بۆ بێنەو بۆم بپێچە، بۆت باس ئەکەم.

دیدەوان(( ئەچێ بە پەلە دیتۆڵ و لۆکەو پلاستەر ئەهێنێ)): ئەمە باشترە، لەفافی چی؟ ئادەی دەستت لابە، تۆ دەست دەستت دەلاییە.

زاهید: خۆ پێڵاوەکانم نەدڕاوە کاکە، باڵمە باڵ، ئازاری دێت.

دیدەوان: ئەی خۆ نابێ لێیگەڕێین؟! با بیبەستین..

عارف(( بەڕاکردنەوە دێتە ژوورەوە، خوێن بە سەریەوە دێتە خوارەوە)): دیدەوان! دیدەوان! کوڕەکان تەقەیان لێکرا، چەکت لایە بچین بە هانایانەوە؟

دیدەوان(( تۆقیو)): ئەی خۆت سەرت چییەتی؟ کوڕەکان کامیان تەقەی لێکراوە؟ بەرکەوتووە؟

عارف: هەورازو ساماڵ و ڕەوەزن. منیش سەیارەیەکی کۆن خۆی پیا کێشام، هەر خوا ڕەحمی کرد.

دیدەوان: دەی با باڵی ئەمیش بپێچین و بڕۆین.

زاهید: وەڵا بابە باش!!!! لە هەموو لایەکەوە هێرشە.

(( ڕەوەزو ساماڵ و هەوراز بە پەلە دێنە ژوورەوە))

دیدەوان: سەلامەتن کاکە؟

ڕەوەز: ئێمە سەلامەتین ئێوەش تەقەتان لێکراوە؟

عارف: ئەوەی ئێمە هیچ نییە، گرنگ سەلامەتیی ئێوەیە.

ساماڵ: وەڵا کاک ڕەوەز نەبووایە هەرسێکمان کوژرابووین!

ڕەوەز: هیچ نەبوو ڕاومانننان.. ئەوەی ئێوە چی بوو زاهید، کاک عارف؟ پێکەوە بوون؟

زاهید: نەوەڵا چوارپێنج مناڵ و تواڵ شەڕیان بوو، چووم لێکیانکەمەوە چەقۆیان پێ بوو، وتم نەبا یەکتر بکوژن، مناڵ و تواڵن و نافامن.. کەچی کە چوومە پێشەوە، بە هەر هەموویان هێرشیان کردە سەر من، دیار بوو داو بوو، بە قەسدی کوشت چەقۆیان ئەوەشاند، باش بوو بەمە ڕزگارم بوو.

عارف: سەیارەیان بۆ منیش ناردبوو، خۆی پیاکێشام.

ڕەوەز: ئەمە چییە کاک دیدەوان؟ بەمجۆرە ئەمڕۆ نا سبەی، هەر زەفەرمان پێ ئەبەن.

دیدەوان: وا منیش بیرئەکەمەوە.. شوێنمان بۆ سەرچڵ و گوڵزارو شەنیا ئاشکرایەو لەوانیش تێپەڕ ناکا.

عارف: ئەی چارەسەر؟

دیدەوان: وا باشترە هەر ئەمشەو بجینەوە ئەو خانووەم لە لادێ، کە لەدەست دارەوان خۆم تیا شاردبۆوەو لەوێوە چاودێریشم پێ ئەکرا.

ڕەوەز: جا ئەوە چۆن ئەکرێ؟

دیدەوان: ئەوانە نمەکی دارەوانی سەگیان کردووە، دڵنیابن هەر کامێکتان لە شارا بمێننەوە، کوژراون، جا تەنها مەسەلەی کاتەو هیچیتر.

زاهید: ئەی نانێ؟ ئاوێ؟ پێویستییەک؟

دیدەوان: خەمتان نەبێ، لەوێ خزم و ناسیاوم هەن و بڕیار وایە چەند گەنجێکیش بخەنە دوام، پەکی هیچمان ناکەوێ، بەڵام ئامان باسی هیچ شتێک بۆ کەس ناکەن.. ئەبێ خۆتان بە کاسب و شتی وا دەربخەن.

عارف: جارێ بزانن ئەو شکاویەی سەرم پێویستیی بە هیچ هەیە یان نا؟ ڕاستە هەر ئەو چارەسەرەمان هەیە.

دیدەوان: ئادەی ساماڵ گیان بۆی تیمارکە!

Cut

دیمەنی – ١٥٥٣ – ش/ د – بەردەرگای ماڵی هەندرێن:

(( هەندرێن بە پێ ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو دوو عەلاگەی پێیە.. ئەگاتە بەردەرگای مەدخەل و نامەیەک ئەبینێ لە زەرفێکی سپییدا، کە زۆر ئاشکرا دیارە، هەڵیئەگرێتەوە ))

هەندرێن: یا ئەڵلا خێر؟ نامە بۆ؟ ئەبێ چی بێ؟

(( دوای ئەوەی دەرگا بە کلیل ئەکاتەوە، عەلاگەکان هەڵئەگرێتەوەو زەرفەکە بەدەستیەوە ئەچێتە ژوورەوە ))

Cut

دیمەنی – ١٥٥٤ – ش / ن – دەلاکخانە:

Mute

(( سەرچڵ لە دەلاکخانەیەکدا سەرچاک ئەکا، لە تەواو بووندایەو کە هەڵئەسێت و کابرا بەروانکەکەی لێ ئەکاتەوە، دەمانچەکەی بە ڕووتیی ئەخاتەوە بەر چۆغەکەی بە جۆرێک دیار نەبێت و پارە ئەدات و ئەچێتە دەرەوە.. کچێک (( لاوێن)) لە دەرەوە، وەک چەکی پێ بێ، شانی داداوە بە دار یان عەموودێکەوەو چاوەڕوانیەتی.. لاوێن تەمەنی نزیکەی ٣٠ساڵێکە، جوان و پۆشتەیە.. چاکەت یان قەمسەڵەیەکی لەبەردایە، بێ مکیاژ.. دواتریش سێ کوڕی گەنج بە گوڕ دێن پێش ئەوەی سەرچڵ بێتە دەرەوە، لەگەڵ لاوێن قسە ئەکەن.. لاوێن ئاوڕ ئەداتەوە بۆ سەرچڵ و ئاماژەی لایکی بۆ ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٥٥٥ – ش/ د – ناو سەیارەی شەنیا ٢:

(( گوڵزارو شەنیا ٢ سەیارەیەکیتری پێیە))

گوڵزار: نامەکە چی تیابوو؟

شەنیا ٢: ئەوەی تیایە، ئەمشەو مێردەکەی تەڵاقی بدات، ئەگەر ئەو بیبینێ، ئەگەر تافانیش هەڵیگرێتەوە، سبەی دەرگامان بۆ ئەخاتە سەرپشت.

گوڵزار: دەستخۆش، ئەم دوو سێ شەوە، هەموومانت خستە چالاکییەوە، بەقەدەر یەکساڵی دیدەوان دەستمان وەشاند هههە.

شەنیا ٢: قوربانی ئێوەبم، ئازایەتی ئێوە بوو.

گوڵزار: ئەم گروپەمان لەوانیتر ناچێ، مادام خۆت ئەڵێی هەموو وەک یەکمان بەرئەکەوێ، کەواتە هەر کەس بۆ خۆی کردووە، خۆ زەمانی ڕەمزی و دیدەوان نییە هههە.

شەنیا ٢: ڕاستە، هەرکەس بۆ خۆی ئەکاو بە کۆمەڵیش ئیش ئەکەین.. جارێ گرنگ ڕێ تەخت کردنی بەردەممانە.

Cut

دیمەنی – ١٥٥٦ – ش/ د – بەر ماڵی نارەوەن – ناو سەیارەی خدر:

(( خدر بە سەیارەکەی دێتە بەر ماڵی نارەوەن، نارەوەن دێت و سەرئەکەوێ، دوای سڵاو))

نارەوەن: خێر؟ چی ڕوویداوە؟

خدر: کچێ چووزانم دیسان ماڵی هەندرێنە، کێشەیان لێ نابڕێ، ئەو ژنەی زۆر گۆبەنگێڕە، خوا ئەزانێ ئەمجارەیان لەسەر چییە؟

نارەوەن: خۆی تەلەفونی بۆ کردی؟

خدر: نا هەندرێن.

نارەوەن: ئەو پیاوە داماو بووە بەدەستییەوە، خوا بکا لەو بابەتەی پێشوو نەبێ.

خدر: وەڵا ئیتر خۆیان ئەزانن.

Cut

دیمەنی -١٥٥٧ – ش/ن – ماڵی نیگار:

(( دەوران دڵخۆش تێل ئەکا.. زوبێر تەماشای ئایپادو نیگار تەلەفزیۆن و چیمەن خەریکی مناڵەکەیەتی))

دەوران: بەڵێ بەڵێ، ئەو شێتە ئەڵێ بەیانی سەعات نۆ ئەچم بۆلای کاکت و تۆش لەوێ بی باشترە، ئەنجامێکم پێیە.

ئامۆ(( دەنگ)): درەنگ نییە ئەگەر ئێستاش بیبینین؟

دەوران: با لووت نەگرێ، حەددی چییە تۆ بچی بۆلای، با ئەو بێتە خزمەتت، ئەی چۆن؟ هههە.

ئامۆ: کچێ پێموتی ئەو شتانە لێک مەدەرەوە، سادەو ڕوون و ڕەوان بە.

دەوران: بەسەرچاو، چۆن لە قسەت دەرئەچم کاکە؟ بەلام جارێ زووە هههە.

زوبێر(( لە جێی خۆیەوە)): کاکت هەرچی وت بە قسەی بکە کچێ.

دەوران: بەسەرچاو باوکە گیان.

ئامۆ: ئەوە مامە زوبێر ئەڵێ چی؟

Cut

دیمەنی – ١٥٥٨ – ش / ن –ماڵی هەندرێن:

(( خدرو هەندرێن و تافان لە لایەکەوە ئەگری.. خدر نامەیەک ئەخوێنێتەوەو بە هەناسە هەڵکێشانەوە لای ئەبا ))

خدر: خوێندمەوە.. چی گەیاندییە دەست تۆ؟

هەندرێن: کە هاتمەوە لەبەردەرگا کەوتبوو، هەڵمگرتەوە بزانم چییە؟ ئەو کارەساتەم بینی کە خوێندتەوە.

خدر: من دوور بە دوور ئەگادارم.. ئەم نامەیە بۆ تێکدانی نێوانی ئێوە نوسراوە، ڕاست نییە تافان ئاگاداری ئەوە نییە نیازی کوشتنی تۆیان هەبووبێ، کە من دوورم خستیتەوە، ئەزانم کێ هەوڵی کوشتنتی ئەداو بۆچی ئەیکوشتی.

هەندرێن: کاک حەمە خدر چی بۆ ئەپۆشی؟ ئەوەتا خۆی ئەڵێ بەڵێ ئاگادار بووم.

خدر((تووڕە)): تۆ لە چی ئاگادار بووی تافان؟ ئادەی قسە بکە.. من ئاگادارم هەموو شتێک لە پشتی تۆوە ئەکرا.

تافان(( بەدەم گریانەوە)): زۆری لێ کردم کە کێ بەنیازی کوشتنی بوو، منیش لە تاوا وتم ئاگادارم، دواتریش پەشیمان بوونەوە، وتم دیدەوان.

خدر(( بۆ هەندرێن)): بەوە بەرگریی لە خۆی کردووە.. وانییە، من ئەزانم ئاگادار نییە.

هەندرێن: ئەی خۆ نامەکەت خوێندەوە باسی ئەکا چۆن تلیاکی بۆ گواستوونەتەوە؟ ئەی خۆ ئەوەش لەژێر ئەشکەنجەدا نییە؟

خدر: هەندرێن گیان، نامەکە بەوە وەرگرە بۆ ئاژاوەنانەوە هەڵدراوەتە ماڵی ئێوەوە.. بەڵام ئەبێ تافان لەوەیا ڕاستگۆ بێ لەگەڵما، ئەزانین کە سزای هەموو جۆرە مامەڵەیەک بە ماددەی هۆشبەرەوە زۆر قورسەو تا پەتەکەیە.. باشتروایە، خۆی دانی پیابنێ، من ئەتوانم ڕێگەی دەرباز بوونی بۆ دابنێم بە مەرجێک بکەوێتەوە ناو ئیشەکە.

تافان: تۆ هەرچییەک بڵێی بە قسەت ئەکەم، بەڵام باوەڕم پێ بکەن شتی وام نەکردووە.

خدر: باشە، بەوە ئەتوانین بزانین دوژمنی ڕاستەقینەمان کێیە.. خۆ منیش نامەم بۆ هاتووە، ئەوی تۆ ئەڵێ ئیشمان لەگەڵ بکە، ئەوی من هەڕەشەی کوشتنم لێ ئەکا.

هەندرێن: کاکە حمەخدر گیان نامەکە زۆر ڕوونە، تکایە بەلاڕێیا مەبەن.. ئیش کردنی چی و حاڵی چی؟ من ئەم نامەیە ئەدەمە دەست پۆلیسەوە.. بەڕاستی شەڕی ئەو تاقمە بە من ناکرێ.

خدر: ئارام بگرە کاکە هەندرێن، بەو هیوایەی بتوانین بە سەرکەوتوویی ئەو شەڕە بکەین و براوەش بین.. شتەکان مەئاڵۆسکێنەو با بزانین چۆن داوێکیان بۆ ئەچنین؟

هەندرێن: برام شەڕی ئەو دۆڵە بۆ بێنمە ئەم کۆڵە؟.. کە پۆلیس هەبێ، بۆ خۆم توشی مەترسیکەم؟

خدر: تۆ ئەو گروپانە ناناسی هەندرێن گیان، مەترسیی لەوێدا زیاترە بە پۆلیس بڵێی، ڕەحمێ بە مناڵەکانت بکە، ئەوە بە من بسپێرەو سەلامەتیتان ئەپارێزم، خزم و کەسی باشم لە دەورە خەمت نەبێ.

هەندرێن: ئەی ئێستا چی لە تافان بکەم؟ بە خوا تۆ زۆر خراپ سەرت لێ تێکدام.

خدر: تافان لێگەڕێ بۆ من و دڵنیابە وەک هەرمێلە ئەیپارێزم، ئەوەی کە خراوەتە مێشکی تۆشەوە، ڕاستی ئەکەمەوە.

هەندرێن: یاخوا وا بێ.

خدر: تۆ بەیانی دەرگای دەرەوەتان با هەر کراوە بێ، وەک ئەوان داوایان کردووە، کە نیشانەی ڕازیی بوونە.. با نامەکەش لای من بێ.

Cut

دیمەنی – ١٥٥٩ - ڕ / د – چایخانەکە:

(( لاوێن کەمێک لە دوور وەستاوە وەک چاوەڕوانی تاکسی بکا.. نارەوەن دێت و لە سەیارەکەی دائەبەزێ.. دڵە بە پەلە بەرەوپیری ئەڕوات و جانتا دبلۆماسییەکەی لێ وەرئەگرێت، لاوێن سەرنجی ئەدات.. هاوڕێش چاوەڕوان ئەکات تا نارەوەن سڵاوی لێ ئەکات و ئەچێتە ژوورەوە، دواتر هاوڕێ چایەک تێ ئەکات و بۆی ئەبات.. سەیارەیەک دێت و لاوێن هەڵئەگرێت و ئەڕوات.. سڵاو و بەخێرهاتن و بەیانی باش ئەکرێت))

Cut

دیمەنی – ١٥٦٠ – ڕ / د – گوند:

(( زستانەو هەموو جلی کوردییان لەبەرایە.. دیدەوان و ساماڵ و عارف لەسەر سەکۆیەکی کەڵەک دانیشتوون.. پاش کەمێک ڕەوەزیش بە باوێشک و خۆکێشانەوەوە دێت بۆلایان))

ڕەوەز: بەیانیتان باش! (( وەڵام)) ئەوە لە کوێ دەموچاو بشۆین هەی نان و دۆ بڕەکان!

دیدەوان: نان و دۆ بڕیش دەرچووین؟ ئەمە بۆ؟

ڕەوەز: ئەی هێشتا نەتبڕیوە مام دارەوان؟ دیارە تۆ ئەمشەو لە پێنج ئەستێرە خەوتوویت و من ئاگام لێت نییە، (( لە ڕوخساری دیدەوان ڕائەمێنێ)) ئۆو هەر لەوێش دەست و دەم و چاوت شتووە!!

عارف: دووەکەیتر هەڵنەساون؟

ڕەوەز: نا ئەو شلەشارییانە نیوەڕۆ خەو ئەکەن!

دیدەوان: ئا ساماڵ بچۆ هەڵیانسێنەو بیانبە بۆ مزگەوتیش.. درەنگە با بزانین شتێ بکەین.. (( ساماڵ ئەچێتە ژوورەکەیان))

ڕەوەز: شتی چی؟ لە ترسی کچێک هەموومانت بەم شاخەیا هەڵگەڕاند.. بابزانی، بشکوژرێم، ئەمشەوی تیا ڕۆژ ناکەمەوە دیدەوان ئەفەنی.

دیدەوان: هێمنبەرەوە کوڕم، پیاو هەر لە خەو هەڵئەسێ کەمێ گرژو تورەیە، زیاتر لەسەری بڕۆین، ئەتەقیتەوە.. جا لێیگەڕێ تا پارووبەکیش ئەخۆن.

ڕەوەز: جا ئەگەر وا نییە بڵێ وا نییە!

دیدەوان: عەیبی نییە.. ماست و هێلکەی لێیە چی ئەخۆی؟

ڕەوەز: خۆتۆ بۆم حازر ناکەی، با بێمەوە شتێک هەڵئەپڕوسکێنم.

(( زاهیدو هەورازیش دێنە دەرەوە)) ________ Cut ________

دیمەنی – ١٥٦١ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

ئاری: بە هەزارجۆر لێکۆڵینەوەمان کردو لای دادوەری لێکۆڵینەوەش هەمان وتەی دووبارە کردەوە.. لەوانەیە ئاگاداری هیچ نەبێ و شەنیا ویستبێتی لەسەر جادە هەر کەسێکی بینی داوای مۆبایلەکەی لێ بکات، تا بە ژمارەی خۆی تێلی بۆ نەکا. چونکە ئەزانێ دوای کوشتنیشی بە لیستی پەیوەندیی دڵنیادا ئەچنەوەو ئەو ژمارانەی پەیوەندیان پێوە کردووە، ئەدۆزرێنەوە.

بەهێز: دادوەر فەرمانی گرتنی بۆ شەنیا دەرکردووە بە تۆمەتی سوتاندنی دڵنیا، بە ماددەی ٤٠٦. گشتاندنی بۆ بکەن و بیدەن بە هەموو بنکەو سەیتەرەکانیش.. کارڕایی تەواو بکەن.

ئاری: وێنەکەشی بنێرین.

بەهێز: ئەی چۆن ناینێرن؟ کابرا ئەڵێ ئەم کچە بوو داوای مۆبایلەکەی لێکردم.

ئاری: بەکەفالەتی شوێنی نیشتەجێ بوون دادوەر بەشێوەیەکی کاتی دۆسیە کابراکەی داخستووە.

بەهێز: زۆر باشە ئیزنیبەن! بە وردیی بۆ ئەویتریش بگەڕێن کە کاک حمە خدر وێنەکەی ناردووە.. ڕەنگە پێی بگەینە شەنیا.

ئاری: فەرمانتە گەورەم..

Cut

دیمەنی – ١٥٦٢ – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( هەندرێن بە تەوازوعەوە دانیشتووەو نارەوەن و خدر))

هەندرێن (( خەندە)): هەر سەیرم لەوە ئەهات چۆن بەو شەوە ئەو هەموو کامێراو وەستاو شاگردەت دەستکەوت؟

خدر: زۆر درەنگ نەبوو، دوکان و بازاڕ مابوون، خۆشم کەمێک ویستم درەنگتر بێ نەک چاودێریتان بکەن، بەو شەوە درەنگەش نەکرایە، ئەمڕۆ هیچمان پێ نەئەکرا.

هەندرێن: نەخێر هیچ نەئەکرا، دەستت خۆش بێ.. ئیتر هەر شتێک بوو، خۆم ئاگادارت ئەکەمەوە، زۆر سوپاست ئەکەین چاک ماندوومان کردی بە خۆمانەوە.. تۆ نەبوویتایە هەر ئەمڕۆ لە دادگاش جیا ئەبووینەوە.

نارەوەن: نا.. نا .. بۆ بگاتە ئەوە منالّتان هەیە، وەک باسیشی ئەکەن خراپ حالّیبیوون بوو.

هەندرێن: ڕێک وابوو، مالّی ئەم پیاوە ئاوا بێ نەیهێشت بە هەلّەیا بچم.

نارەوەن(( سوعبەت)): فریشتەیە فریشتە!

Cut

دیمەنی – ١٥٦٣ – ڕ/د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( لاوێن و سەرچڵ))

سەرچڵ: بۆ نارەوەن چییە نەکوژرێ؟

لاوێن: کاکە سێ چوارێک پاسەوانیی ئەکەن.. سەیارەیەکیش بە دووایەوە بوو، دیار بوو ئەوانیش پاسەوانیی هاتوچۆی ئەکەن.. هیچ دەرفەتت بۆ هەڵناکەوێ دڵنیابە.

سەرچڵ: ترسنۆک خۆت نەتوێراوە، وا ئەزانی لای هەموو کەسێ وایە، گوڵزارم بناردایە، ئێستا هەناسەی لەبەر بڕیبوو!

لاوێن: ئەمجارە گوڵزار بنێرە، بەڵکو بەکوشتی بدەی ئیشەڵڵا هەهە.

سەرچڵ: با کەمێکیتر چاودێرییان بکەم، خۆم بۆی ئەچم، بابزانم ئەوەی تۆ ئەیڵێی وایە؟ یان شڵەژابووی؟

لاوێن: بەچی باوەڕت هەیە، مەگەر بۆی بچیتە ماڵەوە، ئەگینا هیچت پێ ناکرێ.. با یەکێکیشمان تیانەچین بە هۆیەوە.

سەرچڵ: نا.. نا.. کەڵکی ئەوەمان نییە هیچ کەسێک تیا بچێ.. زۆر کەمین.. ئەی ئەو کچەی هاوڕێت نەهات؟

لاوێن: ئارینا؟

سەرچڵ: نازانم، ناوی ئارینا بوو؟

لاوێن: بەڵێ.. ئەمشەو دوای تۆ زۆر پێکەوە بووین.

سەرچڵ: ئەویش وەک تۆ تەنیایە؟

لاوێن: ئەگەر من برایەکم هەیە لە ئەوروپایە، ئەو ئەوەشی نییە.

Cut

دیمەنی - ١٥٦٤ - ڕ/د - گوند:

(( عارف و دیدەوان و زاهیدو هەوراز دانیشتوون، ساماڵ و ڕەوەز بە پێوەن))

زاهید: ئەی کەواتە تۆ وا تێکچووی لەگەڵیا، بۆ دەستی حمەخدری لە پشتەوە نەبێ؟

دیدەوان: نا حمەخدر ئەو سامانەی نییە خەڵکمان بۆ بە کرێ بگرێ و ئەوەمان بەسەر بێنێ ئەو تەنیابالە، ئەوەی پێ ناکرێ.. ئەگەر کەسێک لەو بەرەیە هەبێ بتوانێ ئەوە بکا، نارەوەنە.. ئەو هەیەتی.

ڕەوەز: جا ئەگەر گومانت لەویش هەیە؟ هەر لە ئۆفیسەکەی خۆیا دایئەبێژم.

دیدەوان: کەس نازانێ شەنیا زیندووە یا مردووە؟ گومانی ئێمە لەوەی کە شەوێ ڕوویدا ئەوەیە دەستی ئەوی لە پشتەوە بێ.. بەڵام یەقینین لە زیندوێتیی نارەوەن و بە ڕای من هەر ئەو کردوێتی.

عارف: ئەی چۆن گومانت ئەوەندە تۆخە لەسەر نارەوەن؟

دیدەوان: لەسەر وێنەکانی بوکەکەی؟

عارف: جا وێنە کوا؟ ناڵێی سڕاوەتەوە؟

دیدەوان: لەوانەیە سەرچڵ سڕیبێتییەوە، بەڵام نارەوەن ئەوە چوزانێ؟ لەو کاتەشدا ئەو ترسەکەی هەر ئەمێنێ.

ڕەوەز: وەک پێموتن، من ئەمڕۆ هەر ئەچمە شارو ناشگەڕێمەوە تا پاکیان نەکەمەوە.. ئەوە نارەوەن یەک، ئەمڕۆ نەجاتی ئەدەم.

هەوراز: زۆر بە پەلە مەبن لە شتا.

دیدەوان: تۆ نازانی قسە مەکە.

ڕەوەز: ئەگەر ئەو شەنیایە مابێ، هەر ئەیدۆزمەوە، ئەمجارە هەزار ڕوحی هەبێ و هەزار فرتوفێڵ بکا، نوزەی لێ ئەبڕم.. ئەوە دوو.. سەرچڵ و گوڵزاریشم بۆ دانێن، ئەمە چوار.. کێیتر؟

دیدەوان: کێ لەگەڵیا ئەچێ؟ با تەنیا نەبێ.

ڕەوەز: پێویست ناکا لە شار زۆرم هەیە.

دیدەوان: بۆ ڕێگەو بۆ تەنگانە، هاوەڵیی خراپ نییە.

عارف: ئەوە بە من ناکرێ.

ساماڵ: من هەر ناوێێێێرم!!!! ئەمشەو یەکەمجارم بوو تەقەم لێ بکرێ، هەر تۆقیم.

زاهید(( دەست ئەخاتە سەرشانی هەوراز)): ئەوە بە شلە شاریش ناکرێ ههە.. کەواتە هەر خۆم ئەچم لەگەڵیا.

دیدەوان: بەڵام لە نارەوەنەوە دەست پێ بکەن.

Cut

دیمەنی – ١٥٦٥ – ڕ / د – بەردەرگای ماڵی هەندرێن:

(( شەنیا ٢ لە دەرگا ئەدات، کە کراوەیەو بۆ جەڕەس ئەگەڕێ و لێی ئەدا.. تافان دێتە دەرەوەو دەرگای لێ ئەکاتەوە ))

شەنیا ٢: سڵاو تافان خان، بەیانیت باش.

تافان: بەیانی تۆ باش.. فەرمووی؟!

شەنیا ٢: دەرگاتان بۆ من کراوەتەوە، تێم ئەگەی؟

تافان: ئەی چۆن بەساقە؟ فەرموو فەرموو بچینە ژوورەوە.. ناوی جەنابت؟

شەنیا ٢: من ناوم ئەڤینە.. یەک دوو قسە ئەکەین و ئەڕۆم.

تافان: سەرچاوم بەخێربێی یاخوا ئەڤین خان، ئاخر چۆن هەر لەبەردەرگا؟

شەنیا ٢: نا ئەوە لەبەردەرگاوە ناکرێ، نەک پێمان بچێ ژوورەوە باشترە.. فەرموو تۆ شارەزای فەرموو.

تافان: فەرموو پێشکەوە، یەکسەر هۆڵەکەیە شارەزایی ناوێ هههە.

(( شەنیا ٢ پێش ئەکەوێ و تافان بە دووایەوەو دەرگای مەدخەل دائەخەنەوە.. گوڵزارو کوڕێک دێنە ژوورەوەو کامێراکانی کە دانراوە، بە تووڕەییەوە لێی ئەکەنەوەو پاشان لە دەرگای مەدخەل ئەدەن ))

________ تابع، دوواتر متبوعی هەیە. __________ Cut ____________

دیمەنی – ١٥٦٦ – ڕ / ن – ماڵی زوبێرو نیگار:

(( زوبێر لەسەر عەرەبانەو نیگار لەسەر قەرەوێڵە بە دانیشتنانەوە وەرزش ئەکا، کەمێک بە ناڕەحەتیی))

نیگار: ئەو دووە وا خۆیان نیشانی من ئەدا، کە زۆر ڕقیان لە یەکتر بێتەوە.. کەچی ئاوەها ژێر بەژێر هەزار کەین و بەینیان لە نێوانا بووە.

زوبێر: ئامۆ ئەڵێ دەستی شەنیایە، هەر کە دەرگاو پەنجەرەی دروستکردووە، خەیاڵی لەسەر ئەوە بووە گورزێکمان لێ بوەشێنێ.

نیگار: ئەوکاتە تازە شەنیا هاتبوو، ئەویش خوا بیگرێ ڕەمزی داوای کچێکی ئەکرد، ئەیوت هەر سەرنجی بدەم، ئەزانم بە کەڵک دێت یان نا.. من دەوران چەند کچێکمان برد، هەر ئەیوت باش نیین، تا شەنیام برد، یەکسەر ڕازیی بوو، جا من چووزانم پیلانی خۆیانە، وایان دەرئەبڕی هەر زۆر ڕقیشیان لە یەک بێ.. بەڵام شەنیا شارەزا نەبوو، هەموو شتێک ئەبووایە ئەو ڕەمزییە گۆڕبەگۆڕە ئاگای لێبووایە، ئیتر هەرچی کراوە بە دەسیسەی هەردووکیان کراوە.

زوبێر: جا کێ ناڵێ وەرگەڕانەکەشمان وەک پۆلیس ئەڵێ کەسێک لە پشتییەوە بووە، ئەوان نەبووبن؟

نیگار: ئەی کامێرا تایبەتەکانم ئاشکرای نەکرد ژووری پارەیان لە کارگەی منا دروستکردووە؟ تەبعەن بۆیە وایان لێکردین، تا چاودێریی سەروەت و سامانەکەیان بکەن.

زوبێر: ئا تۆ ئەو کچە بانگکە، بزانە نیوەڕۆ چیمان هەیە؟ههە.

نیگار: سکەڕۆ خەمت نەبێ، بە دڵی خۆتە ههەە.

____________ Cut ____________

دیمەنی – ١٥٦٧ – ڕ / د – لای کانی و ئاوێکی گوند:

(( دیدەوان تەنیایەو بۆ پەناگەیەک ئەگەڕێ، خۆی بەتاڵ بکاتەوەو کەس نەیبینێ))

<u>دیدەوان مۆنۆلۆژی ناوەوە</u>:

چوارپێچکت بە گۆڕم نارەوەن! تفم تێ ئەکەی؟ بیکە.. بە دڵی خۆت تفم تێکە.. بمبینیایە چۆن فیشەک ئەنێن بە ناوی دەمتەوە؟! ئای خوایە کە خۆش ئەبوو.. کێشە نییە، گرنگ تۆپاندنیەتی، با منیش نەیبینم!! هەر ئەمڕۆیەو بەرچاوم لەو سەرو فەسساڵە بەدەت بۆ تا هەتایە پاک ئەبێتەوە... ئا ئا ئا!!! خۆ تفم تێ ئەکا؟

<u>مۆنۆلۆژی تەواو</u>.

(( هەر بەدوای شوێنا ئەگەڕێ))

Cut

دیمەنی – ١٥٦٨ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن دانیشتووەو خدر بە مۆبایل قسە ئەکات و دێتە ژوورەوە))

خدر(( بۆ مۆبایل)): باشە گیانی من دەستت خۆش بێ زۆر سوپاس...... ئاگاداری خۆت بە، دەی کاتی خۆش.

نارەوەن: هیچ هەیە؟

خدر: شتێکی ئەوتۆ نییە، هەر کەمێک زیاتر وریای خۆمان بین.

نارەوەن: دیارە شتێکت بیستووە؟

خدر: نارەگیان شتێک ببیستم چۆن لە تۆی ئەشارمەوە؟ چارەنوسمان بەیەکەوەیە.

نارەوەن: بەخوا یان من بەهەڵەیا چووم؟ یا ڕەنگیشت کەمێک بزڕکاوە؟

خدر: خۆ شیر نییم ببزڕکێ هههە؟

نارەوەن: ئەی ئەوە نییە باش خەڵکت داناوە بۆ پاراستنی هەمووومان؟ ئیتر هەر شتێکیش لای خواوە بێ خۆشە.

خدر: خۆت توشی دڵەڕاوکێ مەکە، هیچ لە ئارایا نییە.. بەس من کەمێک ئەچمە دەرەوە، حەماڵەکان ڕێک بخەمەوە.

نارەوەن: باش.

(( خدر ئەچێتە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٦٩ – متبوع بۆ دیمەنی – ١٥٦١ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( شەنیا٢ لە پێشەوەو تافان دێنە ژوورەوە.. شەنیا٢ باڕوکەکەی لایەبات و عەینەک دائەکەنێ و خۆی ئاشکرا ئەکا، تافان دەم دائەچەقێنێ))

تافان(( ترس)): شەنیا خان؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

(( لە دەرگا ئەدرێ.. گوڵزارو کوڕەکەیتر دێنە ژوورەوەو کامێراکانیان پێیە))

گوڵزار(( پەلەو تووڕە)): سکرینی کامێراکان لە کوێیە؟

تافان(( تۆقیو)): سکرین چییە؟

تافان: مۆنیتەرەکەی بێ ئەقڵ! لە کوێوە بە کامێرا دەرەوە ئەبینی؟

تافان: لەو ژوورەیە.

(( گوڵزارو کوڕەکەیتر ئەچنە ئەو ژوورەوە))

شەنیا: شەو حمە خدرتان بۆچی بانگ کرد؟

تافان(( ترسی زیاتر)): خۆی هات، سەردانیی بوو هیچیتر.

شەنیا: خراپ نییە میوانێک بێت و کامێرای چاودێریت بۆ دانێ.

تافان: ڕاستییەکەی نامەکەتان دەست مێردەکەم کەوتبوو، ئیتر ئەو بانگی کرد.

شەنیا: کێشە نییە، من ئەمەوێ تۆ حەمە خدرمان بۆ ڕاکێشی بۆ ئیشکردن و دەست لە دیدەوان هەڵگرێ، ئەگینا ئەیکوژین.

(( گوڵزارو کوڕەکە دێنە دەرەوەو جیهازو مۆنیتەری کامێراکانیان پێیەو ئەیکێشن بە زەویدا))

تافان: من چیتان بۆ بکەم ئەمرکەن؟

شەنیا(( دەست ئەخاتە سەرشانی و ئەیهێننێتە ئەملاوە)): بڵێ شەنیا ئەیوت دیدەوان باوکی خۆی کوشتووە، لەبەرئەوە جێی متمانە نییە.. دەست لەو هەڵگرێ و بێتە لای من، هەرچی بوێ ئەیدەمێ و لە خۆم زیاتر ئەیپارێزم بێخەم بێت.. بڵێ ئەیوت با پێکەوە ئیش بکەین و کەسیش بەوە نەزانێ.

تافان: بەسەرچاو، من پێی ڕائەگەیەنم، هەر ئەمڕۆ.

گوڵزار: ئەگەر رازیش نابێ، خوێنی تۆو ئەو بەسەر یەکەوە ئەڕێژین با بزانی.. ئیتر کەیفی خۆتانە.

شەنیا: سوپاس بۆ پێشوازییە گەرمەکەت.. خواحافیز.

(( باڕوکەو عەینەک  هەڵئەگرێتەوەو ئەچنە دەرەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٧٠ – ڕ/ د – لای سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕەوەزو ڕێبوار وەستاون))

ڕەوەز: وەک وتم هەموو شتێک شێواوە.. ئێمە بۆ خۆمان ببەستینەوە بە چارەنوسی دیدەوانەوە؟ یان شەنیاوە ئەگەر ماوە یان مردووە؟ تاقەتی ئەو سەرێشەیەمان نییە، بۆ خۆمان ئیش ئەکەین و چاوی هەموو لایەکیان دەرئەهات، لەبەرئەوە ئەمجارە بە ناوی منەوە پێی بڵێ و پەیوەندییەکیشم کردووە.

ڕێبوار: نا مەسەلە ئەوە نییە ئیش بۆ کێ ئەکا، وا تێگەیشتووە کە ئەم جۆرە گروپانە بەزەییان بە ئەندامەکانی خۆیانا نایەتەوەو هەر کاتێ ئیشیان پێیان نەما ئەیانکوژن، جا یان خۆیان یا کەسوکاریان.

ڕەوەز: ئەو ترسەی لەدڵا بڕەوێنەوەو پێی بڵێ ئەم گروپە جیاوازین و هەموو وەک خوشک و برا ئیش ئەکەین و یەکتر ئەپارێزین.

ڕێبوار: بەخوا کاک ڕەوەز تافان کەمێک سەرسەختە.. بەڵام ئەی چۆن جیائەبیتەوە لە دیدەوان؟

ڕەوەز: جارێ نا.. ئەو زۆر مەبەستیەتی نارەوەنی بۆ بکوژم، بەوە هیچ گومانێکی لا نامێنێ کە هەر پیاوی خۆی بم.. ئەوەی بۆ ئەکەم و بەرامبەر بەوەش هەندێ کڕیارو فرۆشیاری پێ ئەناسم، کە بتوانین خۆشمان ئیشەکە فراوانتر بکەین، لە کیلۆو دوو کیلۆیا نەمێنێ.. دواییش یەک فیشەک ئەنێم بە ناوی دەمیەوە ئەگەر ڕێگرییمان لێ بکا.

ڕێبوار: ئێستا چەند کەسین؟

ڕەوەز: چووینەتە هەشت کەس بە تۆو زاهیدیشەوە.. ئەوانیتر دەست و پێن، هیچ نیین.. بەڵام من پێویستیم بە سێ چوار کچۆڵەو ژنی گەنجیش هەیە، ئەوە بۆ پەیوەندیی دیبلۆماسیی لەگەڵ کڕیارو فرۆشیارەکان زۆر گرنگە.

ڕێبوار: ئەگەر تافان بێت ئاسان ئەبێ هەرچەندە بڕوا ناکەم، بەڵام کە نەیەت کێشەیە!

ڕەوەز: تۆ لە ئێستاوە بیرم بۆ بکەرەوە، بەڵام لەو کچانە بن کەسوکاریان فەرامۆشیان کردوون باشترە، ئەها وەک گوڵزارو شەنیا، ئاگات لێیە چەند هارن؟

ڕێبوار: ئەی سەرچڵ و گوڵزارت بۆ نایەتەوە؟

ڕەوەز: نازانم کەوتوونەتە کوێوە، ئەگینا قسەیەکیان لەگەڵ ئەکەم.

ڕێبوار: دەستکەوتنی کچان زەحمەتە، هەریەکەو لیوایەک پاسەوانی هەیە لە ماڵەوە، ئەمە باوک و براو خاڵ و مام و ئامۆزو پورزاو کورە چوزانم.. باوەڕ ناکەم من کەسم پێ پەیابکرێ.

ڕەوەز: جا تۆ هەروا تەپۆ نەبووی؟ ئەبێ بۆت ئامادە بکرێ و پێت بوترێ بچۆ ئەوە بکەو ئەوە مەکە.. ئەوەتا تافانێکی گەڕت بۆ نایەتەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٧١ – ڕ / د – بەردەمی چاپخانەکە:

(( خدرو ئەحەو کاروان و سەفین و عەبەو دڵەو هاوڕێی چاپچی))

خدر: تەنها کاتێ کە ئەزانی خەریکە کار لە کار بترازێ، ئەگینا کوشتن نا، ئەگەر هەڵات، قاچی بپێکن، دەمانچەی هەڵکێشا، هەوڵ بدەن دەستی پەک بخەن، شان و باڵ، لە ڕانیەوە بۆ خوارەوە، زۆر خۆتان لە کوشتن بە دوور بگرن ئامان!

هاوڕێ: دەی وەڵا ئەمە هیچ یاسا نییە، ئەو هەر سوور بێ لەسەر کوشتنم و من بۆم نەبێ بیکوژم، بەس بیپێکم، دواتریش چەند ساڵێ زیندانیی بکرێت و بۆم بێتەوە دەرەوە.

کاروان: بە مەرجێ ئەو تۆ ئەناسێت و بۆ کوشتنت هاتووە، تۆش نازانی ئەو کێیە، کەواتە ئەگەر ئاگات لە خۆت نەبێ و زەفەرت پێ ببا، ئەوە گەردنی ئازا بێ و تەواو.

خدر: ئاخر دەبەنگییەکەتان لەوەدایە ڕۆڵە، کوشتن بۆ؟ کە تۆ بتوانی بیپێکیت و بیگریت؟ ناشزانن یەک شەو زیندانیی کردن چی ئەگەیەنێ؟ یاخوا نەگیرێن، ئەوسا ئەڵێن یەک مانگیش زیندانیی بێت زۆرە.

عەبە: بە کورتی، زۆر هەوڵ ئەدەین نەکوژرێ و ئەگەر هەر چارەسەریمان بۆ نەکرا، ئەوا خوا عافوویکاو جێی دۆزەخی بەرین بێ.

خدر: ئەحە گیان تۆ پاراستنی ئاواو ژنەکەیت پێ سپێرراوەو وریاتربە.. عەبەو سەفین، بەردەرگای ئۆفیس.

دڵە: مەبەستت ئەوەیە من لەوێ نەمێنم؟

خدر: بەڵێ تۆو کارە خەیاڵتان ئەڕواو هەموو کەسێ ئەتوانێ بتانگەوجێنێ.. ئێوە بۆ ناو ئەو سەیارەیەی ئاگاداری خۆمان ئەبن.. ئیتر بە گێلێتیی و گەمژەیی کار ناچێتە سەرو گرەوەکە لەسەر ژیانی ئێمەیە.

کارە: ئەمانبینی چۆن ئەبین؟

دڵە: هەڵە کردن هەر یەکجارەو هەوڵ ئەدەین دووبارە نەبێتەوە، بە تایبەت کە ئێستا ئەرکەکەمان گرنگترو هەستیارترە.

خدر: نامەکانی ژێر قنگتان جوان بوو!!! هەهە زۆر خۆتان هەڵمەفشێنن! ئیتر هەڵە لە یەک کەس قبوڵ ناکەم و هەر هەڵەیەک بۆ ئەو زیندانەتان ئەبا، کە هەرگیز خۆزگەی پێ ناخوازن.

هاوڕێ: ئەی من کاک حەمەخدر گیان؟ هەر ئیشەکەی خۆم؟

خدر: زۆر لێت ڕازیم هاوڕێ گیان، بە ڕاستی چاودێریی گشتیی هەر لە خۆت دێت.. زانیت هەر لایەکیش کەوتە سەغڵەتییەوە، ئیشی خۆت باش ئەزانی.. دەستخۆش.. (( چەند نوسخەیەک لە وێنەی ڕەوەز دەرئەهێنێ)) ئەمەش وێنەی یەکێک لە بکوژەکانە، مەترسیدارەو وریای بن.

Cut

دیمەنی – ١٥٧٢ – ڕ / د – باخی شەنیا:

(( ڤێللاو باخی شەنیایە.. بە جلی زستانەوە.. شەنیاو گوڵزارو لاوێن و ئارینا ))

شەنیا: ئێرە تەنها ئێوە ئەیزانن.. نامەوێ هیچ پیاوێک بەم جێگەیەمان بزانێ.

گوڵزار: ئەی سەرچڵ؟

شەنیا: هیچ پیاوێکیان متمانەی ئەوەی نییە ئێرە بزانێ.. کێشەمان چییە؟ ویستمان هەر یەکێکیان ببینین، ئەوە خانووەکەی ناو شار هەیە.. با ئێرە بۆ پشوو و خۆ پاراستنی خۆمان بێ.. باش بوو باسی سەرچڵیشت کرد، پێی بڵێ شەنیا ئەیوت ئیتر کاتی یەکتر بینین هاتووە.

گوڵزار: بەسەرچاو.. ئاریناش هەر ئەبەمە شوقەکەی خۆم هەفتەیەک لام بێ، تا تەواو چاوی بکرێتەوەو بزانێت ڕێ و شوێنی ئیشی ئێمە چۆنەو چۆن خۆمان لە مەترسیی بپارێزین.

شەنیا: تەقە کردنیشی فێر ئەکەی؟!

گوڵزار: ئەوە دوا ڕاهێنانیەتی.

لاوێن: گوڵزار زۆر باشە بۆ تێگەیاندن، باوەڕ بکە لە دووریی بیست مەتر زیاترەوە بە ئیسراحەت نیشان ئەپێکم.. ها ها ها، ئەوەندە بوکەڵەی پێ شڕو وڕ کردووم، کوشتن و ئاو خواردنەوەم لا بووە بە یەک، خەمت نەبێ ئارینا گیان، دوای ١٠ ڕۆژیتر ئەمە قسەی تۆش ئەبێ.

شەنیا: دەستی خۆش بێ زۆری لێ ڕا ئەبینم گوڵەکەی خۆم.. ئا ئیتر لەمڕۆوە ئێرە ناو ئەنێین کونەگورگ.

ئارینا: جا ئەم بەهەشتە کونە گورگ بێ، ئەبێ سەراو خانوو چی بێت؟

گوڵزار: بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێکیش گوێی لێ بوو وتمان لە کونە گورگەکە یەکتر ببینین، ئەو وا ئەزانێ ژوورێک یان ئەوپەڕی خانوویەکی بچووکە.. ئەوە ئەقڵی گەورە ناوی ناوە هههە.

لاوێن: کەواتە ئیتر بە شەنیا خانیش ئەڵیین ئەقڵی گەورە، بۆ ئەوەی کەس نەزانێ باسی کێ ئەکەین.

گوڵزار(( ناولەپی لەگەڵا ئەکێشێ بە یەکا)): ئافەرین هەی بیری تازە.

شەنیا: کەواتە لاوێنیش ناو ئەنێین بیری تازەو ئاریناش سەرەکیی.

گوڵزار: یەعنی من لاوەکیم؟

شەنیا: دەمخۆش، تۆ لاوەکیی.. بۆئەوەی بە سیفاتەکانا کەس نەناسرێتەوە، ئارینا گیان ئەمڕۆ هاتووە، پێی بوترێ سەرەکیی، هەموو کەسێ لای وایە، یان منم یان تۆی.

گوڵزار: ئەی بۆچی ناومان ناوی ئەقڵی گەورە.. تەواو!.. ڕێککەوتین.

Cut

دیمەنی – ١٥٧٣ – ڕ / ن – چاپخانەی تیرۆژ:

(( تیرۆژ دانیشتووەو پاش کەمێک ئامۆ دێت ))

تیرۆژ: ئەڵێی ئێستا هەستاوی؟

ئامۆ(( سەرپێی )): نا نا یەکجار واش نا.. نانیشم خواردو ئینجا وتم با سەرێکی تیرە گیان بەم ئەوسا بچم بەلای ئیشمەوە.

تیرۆژ: قوربانت کاکە گیان.. تەبعەن لە دەرەوە نانت خوارد!

ئامۆ: ئەی وا نیوەڕۆیە خۆ دانانیشم پەنیرو ماستەکەی نارەخانی دایکت بخۆم هههە؟

تیرۆژ: قەینا ئەوە بۆ ئێمە، با بمرین لە برسا.

ئامۆ(( پێکەنین )): هیچ ئیش جوڵا؟

تیرۆژ: دوای ڕێکلامەکان کەمێک باشترە، بەس بەخوا هیچ نییە!

ئامۆ: نائومێد مەبە، هەروا ئەبێ، سەرەتای هەموو ئیشێک کەمێ زەحمەتە تا ئەناسرێی.

تیرۆژ: وابزانم دیزاینمان باش نییەو مۆدێلەکەی کۆنە.. بزانم هەستیی قەناعەت پێ ناکەم بیهێنمە لای خۆمان؟ یان لەمناوە دوکانی بۆ دانێم.

ئامۆ: تۆ ئۆفەرێکیتریشت لە بەردەستتایە بیرت نەچێ.. هەرکاتێ تەواو نائومێد بوویت، من نەخۆشخانەکەت ئەدەمێ.

تیرۆژ: ئەی خۆت؟

ئامۆ: ئۆووو ئەگەر وابزانی بێ ئیش ئەبم، باش نامناسی.. دەی جارێ ئەڕۆم، تۆ خۆت سەرپشککە.

تیرۆژ: جارێ با تەواو بگەمە بێ هیوایی! (( ڕۆشتنی ئامۆو خواحافیزیی ))

Cut

دیمەنی – ١٥٧٤ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( بە سەیارەکەی خدر، نارەوەن و خدر ئەچن بۆ ماڵی هەندرێن.. کە خدر سەیارە ڕائەگرێت، سەیارەکەی دڵەو کارەش کەمێک دوورتر لە پشتیانەوە ئەوەستێت.. دائەبەزن و لە دەرگادان و تافان دەرگا ئەکاتەوەو بەخێرهاتنی گەرم و یەکتر ماچ کردن لەگەڵ نارەوەن و چوونە ژوورەوە.. پاش کەمێک دوو سەیارە تێپەڕ ئەبن و سەرنجی سەیارەکەی دڵەو کارە ئەدەن.. دوو سەیارەکە یەکیان سەرچڵی تیایەو ئەویتریش ڕەوەزو ڕێبوار، کە خاوتر تێئەپەڕن))

# (( ئەڵقەی حەفتاو پێنج))

ربط ———— Cut ————

دیمەنی – ١٥٧٥ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( نیناو ئاوا ))

ئاوا: ئەی کێ دانێین؟

نینا: نازانم، بەڵام لەوە دڵنیابە کاک حەمەخدر نایپەرژێ.. ئەی بۆ دەورانی تازە خوشک بانگ ناکەی؟

ئاوا: ئەو چووزانێ ئیشی ئێرە ڕابیکا؟

نینا: هۆو ..... دۆزیمەوە، تریفەی خوشکت.. ئێستا دایکت لە وەکالەتەکەیەو کاک حمەخدریش، پێویستیان بەو نییە.

ئاوا: ڕێک هەڵیگێڕەوە، دایکم بێتە ئێرەو ئەو دووەش با لە وەکالەتەکە بن.. ئێستا بە دایکم ئەڵێم.

نینا: ئەگەر هەر بچینە ئەڵمانیا دوو هەفتەکە بەسە.. بەڵام ئەترسم زیاترمان پێ بچێ.

ئاوا: تۆ با جارێ یەکێ مسۆگەرکەم بۆ ئێرە، ئەوسا بیری لێ بکەینەوە باشترە.

نینا: دەی بزانە.

(( ئاوا تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٥٧٦ – ڕ/ د – سەر شەقامێک:

(( گوڵزار وەستاوەو سەرچڵ بە سەیارەکەیەوە دێتە بەردەمی، هەر لە لە جامی سەکنەوە ))

سەرچڵ: ئەو ئیشە چییە ئەوەندە بە پەلەیە؟

گوڵزار(( بە پۆزەوە )): ئم .. ئەوە زەحمەت نییە تا ماڵی ئەقڵی گەورەم بگەیەنیت؟

سەرچڵ: ئەقڵی گەورە کێیە؟

گوڵزار(( بە چرپە )): شەنیا خانی گوڵ.

سەرچڵ(( خۆشحاڵ )): ئۆو گەیشتنە ئەوەی ماڵی تازەتان هەبێ؟

گوڵزار: ئەی خۆ لەسەر جادە ناخەوین؟

سەرچڵ: سەرکەوە سەرکەوە قسەزل.

(( گوڵزار سەرئەکەوێت و ئەڕۆن ))

Cut

دیمەنی – ١٥٧٧ – ڕ/ د – بەر ئۆفیسی وەکالەت – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕەوەزو زاهید پارچە کاغەزێک و قەڵەمێکی بەدەستەوەیە، تەماشای ئۆفیسی وەکالەت ئەکا ))

ڕەوەز: لەسەر کاغەزەکە شوێنی پاسەوانەکان دیاری بکە.

زاهید: هاتوچۆش هەیە، کە دووبارە ئەبنەوە، من لەو باوەڕەیام ئەوانیش هەر پاسەوانی پیرێژن بن.

ڕەوەز: تۆ جێگیرەکان دیاریکەو ئەوانیتریش ژمارەیان وەرگرە.

زاهید(( هەندێ خاڵ دائەنێ لە دەوری چوارگۆشەیەک کە خی کێشاویەتی)): ئەم کابرایە لە جەنەڕالی سەربازیی خانەنشین ئەچێ.. ئەوەندە مەحکەم دایناون، کەس زەفەر بەو ئۆفیسە نابا.

ڕەوەز: چەند کەسن؟

زاهید: پێنجی جێگیرو شەشی پیاوە.

ڕەوەز(( بێزارو تووڕە)): هینااااا؟ بۆ پیرێژنێک چییە ئەو هەموو پاسەوانەی هەبێ؟

زاهید: پارەی هەیەو خۆیشی لە سەروو هەموو شتێکەوەیە.

ڕەوەز: دەی سا هەر ئەبێ بیکوژم، ئەگەر دە ئەوەندەیتریشی بەدواوە بێ.. پێت نەوتم.. ئەو جێگیرانەی ئەمڕۆش هەر ئەوانەی دوێنێن؟

زاهید: بەڵێ، هەموو ڕۆژێک هەر ئەو دەموچاوانەن.

ڕەوەز: ئەی خۆ قسەی پیرەمێردەکەش ناهێنمە سەر خۆم، هەر ئەبێ چارەسەرێکی بۆ بدۆزمەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٧٨ – ڕ/ن – ژوورێکی سادە:

(( شەنیاو گوڵزارو سەرچڵ زۆر دڵخۆشن.. لاوێن و ئارینا ئاسایی دانیشتوون))

شەنیا: بەردەوام باسم ئەکردی، زۆر سەیر بوو، لەو ڕۆژەوەی دڵنیامان کرد بە قوربانیی خۆم، ئیتر هەستێکی سەیرم تیا دروست بوو بەرامبەر بەو هەموو چاکەیەی تۆو گوڵە گیان لەگەڵتانا کردم.. چۆن وا زوو ڕازیی بوون نازانم؟ هههە.

سەرچڵ: جا ئەوە بۆیە بە قەسدی سەر تەقەم لەو ڕەوەزو سامالە خوێرییە کرد، کە هاتینە دەرەوە ڕەوەز ئەڵێ ئەملاولا نەکەن ها! باش دڵنیا بن لەوەی ئەمرێ.

گوڵزار: شەرت بێ ئەو ڕەوەزە بەم دەستانەی خۆم بیکوژم، زۆرباش بوو کە تەقەت لێکرد بەرنەکەوت.

شەنیا: لە هەر شوێنێ بینیتانن پێش نارەوەن ئەوانم بۆ بکوژن.

سەرچڵ: وەڵا نارەوەن لە دەست دەرچووە شەنە گیان، ئەمڕۆ دوای خۆی و خدرەکە کەوتم، سەیارەیەک دووانی تیا بوو پاسەوانیی ئەکردن، ئەڵێی شتێکیان بیستووە.

گوڵزار: ئەچوون بۆ ماڵی تافانەکە؟

سەرچڵ: چۆنت زانی؟

گوڵزار: ئاخر هەڕەشەیەکی وامان جێ نەهێشت بە پەلە تەلەفون بۆ خدر نەکا هههە.

شەنیا: کەواتە کوشتنی نارەوەن زەحمەت بووە.

سەرچڵ: هیچ شتێ زەحمەت نییە، بەڵام ڕەنگە حمە خدریشی پێوە بێ.

شەنیا: ئینجا چییە؟

سەرچڵ: دەی کەواتە خۆم و سێ چوارێک بین باشە، هەر چوارو پێنجیان بخەین بەسەر یەکا.. وا نەبێ ناکرێ.

گوڵزار: ئەوە خۆم سەردەستەکەتان ئەبم هههە کە خۆشە!

شەنیا: جارێ یەک دوو بەرنامەیتریشم لە مێشکایە، ئەوانەش هەر هەوڵن.

سەرچڵ: ئاخر بەقوربان، وا نەبێ بئالۆسکێن.

شەنیا خەمت نەبێ.

لاوێن: منیش لەگەڵتانم.

سەرچڵ: لە ئازایەتیی هەردووکتان ڕائەبینم.

ئارینا: ئەگەر گەیشتە ئەو کاتەی منیش فێر بووبم، منیش دێم.

شەنیا: ئیشیترم بە ئێوەیە، جارێ بێدەنگ بن..

گوڵزار: ئەوەی نارەوەنیش هەر پەیوەندیی بە ئامۆوەیە؟

شەنیا: ئەی وەک خۆیم لە نەخۆشخانەکەی بۆ نەکوژرا با دایکی بێ، هەست ئەکەم هەمووی لە ژێر سەری دایکە جانانەکەیا بووبێ.. من وەک چەسپە ئەمەریکییەکەم، بە شتێکەوە گرتم لێی نابمەوە.

گوڵزار: ئەو دڵی شکاندووی ئێمەش دڵی ئەشکێنین، خەمت نەبێ ئەقڵی گەورە.

Cut

دیمەنی – ١٥٧٩ – مربوط بە دیمەنی – ١٥٧٤ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( نارەوەن تێل ئەکا، خدرو تافان سەیری ئەکەن))

نارەوەن: باشە دایە گیان کە گەڕاینەوە باسی ئەکەین.. ئێستا سەرقاڵم........ خواحافیزت بێ.. (( خدر بە چاو لێی ئەپرسێ چی بوو)) هیچ نییە ئاوا ئەیەوێ لەگەڵ مەدام سەفەرکەن.

خدر(( بۆ تافان)): ئێستا وەک پێموتی، مەرجی من بە جیا باس بکەو بڵێ خۆشم ئەو مەرجەم هەیە.. بە هیچ شێوەیەک لە مەرجەکان پەشیمان مەبەرەوە.

تافان: بەسەرچاو، خەمت نەبێت..

خدر: بە هیچ جۆرێک هیچ ناڵێیت و هیچ پرسیارێکیتری لێ مەکە، با ئەو خۆی قسەبکا، باشە دایکەکەم.

تافان: بەڵێ باش.

خدر: ئەگەر هیچت پێویست نییە، ئێمە ئەڕۆین.. کامێرای چاودێریشت لە شوێنیترەوە بۆ دائەنێم و ئەیبەستمەوە بە مۆبایلەکەشمەوە، بەردەوام ئاگام لێت ئەبێ.

تافان: زۆر سوپاس.. بەڕاستی هەر تۆقیم، هەموو گیانم ئەلەرزی کە بینیمن ئەتوت دڕندەو شتی وان.

نارەوەن: ناهەقت نییە ڕاست ئەکەی بەساقە!

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ١٥٨٠ – ڕ/ د – چایخانەیەک:

(( ڕەوەزو ڕێبوارو زاهید دانیشتوون))

زاهید: جا ئەزانیێ؟ ئێرە ئەزانیێ؟

ڕەوەز: ئا، من لەگەڵ ساماڵ قسەم کردو ناونیشانی ئێرەم داوەتیێ، وتی شارەزام و خۆی کاتیشی دانا.

ڕێبوار: ناوی چییە؟

ڕەوەز: ئەڵێ ناوی دلێرە.

زاهید: کاتەکە لایداوە، خوا بکا زوو بگات.

ڕەوەز: پەیا ئەبێ، من حەزم کرد کات تێپەڕی، با هەر لەڕێوە گوێی ڕاکێشم، ئیتر خۆی دەستەمۆ ئەبێ.

زاهید: هەر خوا بکا ناوەکەی خەسار نەکردبێ ئیتر قەینا چارەکێکیش بۆ ئەو.

(( دلێر دێت و چاو ئەگێڕێ))

ڕەوەز(( دیقەتی ئەداو بانگی ئەکا)): وەرە گێژوویژ!

دلێر: من ئەڵێی؟

ڕەوەز: ئەی هەر تۆ چاوناگێڕیت؟ ئاوەرە بزانم ناوت چییە؟

دلێر: ناوم دلێرە، دیارە جەنابت کاک ڕەوەزی؟

ڕەوەز(( هەڵئەسێت و گوێی ئەگرێ)): ئاوا ئیشم بۆ ئەکەی؟ ئەزانی سەعات چەندە؟

دلێر: ئاخ گوێم.. ببورە جادە زۆر قەرەباڵغ بوو.

ڕەوەز: جارێکیتر پێش کاتی خۆی چاوەڕێم ئەکەی تێگەیشتی؟

دلێر: بەسەرچاو گەورەم تۆ ئەمرەکەی.

زاهید: ئا وەرەناموبارەک.. (( دلێر ئەچێتە لایەوە)) نیشان پێکانت چۆنە؟

دلێر: بەس چاوم لێی بێ، ئەیپێکم.

ڕێبوار: خۆ فشەکەر نیت؟

دلێر: ئەتوانن تاقیم بکەنەوە.

ڕەوەز: یەک قسەت لە دەم بکەوێ لە هەر شوێنێک، دڵنیابە لووتت ئەبڕم و ئەتکەم بە پەندی زەمانە.

ڕێبوار: ئەوە هیچ نییە کاک ڕەوەز جوانکاریی بۆ ئەکاو وەک خۆی لێدێتەوە.. هههه.

ڕەوەز: باوەڕ ناکەم وەک تۆ دەبەنگ بێ و نەزانێ مەبەستم چییە؟

دلێر: گەورەم زۆر باش تێ ئەگەم، خەمت نەبێ، من زۆر تاقەتی قسە گێڕانەوەم نییە.

ڕەوەز: دە ئینجا دانیشەو پێت بڵێین ئیش و کارت چی ئەبێ لەگەڵ ئێمەیا.

(( دلێر ئەچێتە نێوان ڕەوەزو زاهیدەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٨١ – ڕ/ن – نەخۆشخانەی زوبێر – ژووری زوبێر:

(( ئامۆ و بروسک دانیشتوون))

ئامۆ: بەڵێ هەر هەمووی بگۆڕە، هەمووی ئەو کارگەیەی نیگارخان دروستی کرد.

بروسک: دەرگای گشتیش؟

ئامۆ: هەر هەمووی نۆژەنکەرەوە کاکە بروسک، با دڵنیابین لە ناوەوە.

بروسک: بەسەرچاو، تەوالێتەکانیش ئەگۆڕم.

ئامۆ: بەڵام تکایە بە ناسیاوی مەکە، با کەسێک بێ هەر نەیناسیت باشترە.

بروسک: ڕاستە، ئەوی ناسیاو پێیکردین، قەت بێگانە ئەو بوێرییەی تیا نییە.

ئامۆ: ئێمەش سەرەتا کەسیانمان نەئەناسی، بەڵام نەمزانی شەنیا لە پڕ پەیابوو.

بروسک: گوێ مەدەرێ قوربان.. ئەوەش تەواو بوو شوکور بە سەلامەتیی ئێوەوە تێپەڕی، ئەی ئەگەر خوانەکردە شتێک ڕووی بدایە؟

Cut

دیمەنی – ١٥٨٢ – ڕ /ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( نارەوەن و خدر))

نارەوەن: جا من ئەو هەموو پاسەوانەم بۆ چییە؟

خدر: کوا پاسەوان؟ هەر خۆیان حەزیان ئەکرد چاخانەکە بێننە ئەملاترو ئیتر کە بێ ئیش ئەبن لەوێ کۆئەبنەوە.. خۆ گەر چاوێکیشیان لە ئێمە بێ خراپ نییە.

نارەوەن: دیدەوانیش بە جارێ ون بوو ئەزانی؟ وێنەکانیشی بڵاو نەکردەوە.

خدر: پێموتی لای نەماوە، ئەگینا بڵاوی کردبوونەوە.

نارەوەن: تەواو؟؟؟؟ ئیتر ترسم نەمێنێ؟

خدر: بۆ ئەترسای؟ هەه

نارەوەن: نازانم ئەم ماوەیە تەواو دڵم گوشراوە، ڕاستییەکەی لە هەموو شتێک ئەترسم، تەنانەت لەوانەی بەردەرگاش.. نازانم بۆ حەز ئەکەم چەند ڕۆژێک هەر نەیەمە دەرەوە؟

خدر: دەی ئەوەم زۆر پێخۆشە.. لە بەیانییەوە بۆ ماوەی هەفتەیەک خۆت ونکە.

نارەوەن: حەمەخدر تۆ شتێک ئەزانی و لێم ئەشاریتەوە، بەقەدەر پارێزگارێک پاسەوانت بۆ داناوم و بەردەوامیش چاوت لەسەرمەو سڵ لە هەموو تەلەفونێکیش ئەکەی کە بۆم دێت.. وا ئێستاش ئەڵێی خۆت ونکە.

خدر: نا گومانی خۆتە، من حەز ئەکەم بەردەوام لەگەڵ خۆما بیت، منیش گومان ئەکەم ئەم دیدەوان و شەنیایە نەهێڵن ئاسوودە بژین.. هەر ئەوەیەو هیچیتر.

(( ئاواو نینا دێنە ژوورەوەو بەخێرهاتن))

Cut

دیمەنی – ١٥٨٣ – ش/ن – گوند:

(( لەبەر لۆكس و چرا دیدەوان و سامالٚ و عارف و هەوراز دانیشتوون))

عارف: چەند كەسێكیترمان پێویستە، كار وا بڕوا ڕەوەز بالٚمان بەسەرا ئەكێشێ، كەسیشمان لە ڕەمزی زیاتر نیین بۆ ئەوان.

دیدەوان: سامالٚ چەند كەسێكی لایە، با بگەڕێینەوەو تۆزێک ئەو چەتیوە هێور بێتەوە، ئەیانهێنینە لای خۆمان. ئەی ئەوەی مام تەیفور چی بوو؟

دیدەوان: نازانم مەسەلە چییە، ئەم ماوەیە، كەمێ سارد ئەیبینم و ئەوانەشی هەر پەیا نەكرد.

عارف: هیچ كەیفی خۆیەتی.. ڕەنگە هاتنی ئێمەی لەگەلٚتا پێ ناخۆش بێ.

دیدەوان: كورە ئەوانەی خۆمان بە قسەم ناكەن، ئینجا مام تەیفور؟

عارف: ئای.. بە گیانی تۆ ئا ئەوەندە متمانەم بەو ڕەوەزە نییە، تا ئێستا ژنێكی بۆ نەكوژراوە، بیانوومان بۆ ئەهێنێتەوە، وەلٚا پاسەوانی هەیە.. بۆ ئەم ژنە بوو بەچی؟ ئەلیزابێثە؟!! ئۆلٚبرایتە؟ مارگرێت تاتشەرە؟ چی؟ هههههە.

دیدەوان: منیش گومانی لێ ئەكەم ئەوە ڕاست بێ.. ڕەنگە خۆی ڕادەستی ئەو ژنەو حەمەخدر كردبێت و ئەو بابەتەی بە پارەیەک پێ فرۆشتبن.. چووزانم، لە ئاستی پارەیا بە چۆكا دێن، هەر هەموویان، ئەم سامالٚە نەبێ.

سامالٚ: من بچووكیت ئەكەم تا مابم گەورەم.

عارف: بەیانی مریەم دێت؟

دیدەوان: بڕیار وایە.. خوا بكا كەلوپەلەكە ئامادە نەبووبێ.. وەزعمان زۆر شڕەو هیچمان پێ ناكرێ.

عارف: ئەی نالٚێی كەسوكارم لێرە هەن؟ بێ ئەوەی ئەوانیتریش پێ بزانن، تۆ ئیشی خۆتیان پێ بكە، ئەگەر ڕاستەو بەقسەت ئەكەن.

دیدەوان: ئەی پارەکەی؟ من لێرە بەشی خەرجیی زیاترم پێ نییەو باسی مام تەیفوریشم بۆ کردی.

عارف: با مریەم ئەمجارەیان بە قەرز بمانداتێ، یان بتکا بە شەریک و پێشوەخت پارەیەکی مۆڵ بێنێ.

دیدەوان: ههە جا کە مریەم خۆی بیهێنێتە وڵاتەوەو خۆشی بیباتە دەرەوە، من بۆ بکا بە شەریک؟

عارف: من ئەچمەوە شارو پارەیەکی باشی بۆ ئەهێنم، تۆش وەرەو هەرچیت هەیەو نییە بیخەرە ئیشەکەوە، هەوراز تۆش پارە ئەهێنیت.

هەوراز: بەسەرچاو.

عارف: هەرچییەکیشمان لێ برا، با مریەم وەک قەرزی دەستیی بمانداتێ.. هیچ ناکرێ لەوە زیاتر ئەگینا ناووناوبانگی کارکردنمان ئەزڕێ و ئیتر هیچمان نادەنێ.

دیدەوان: بەدڵمە، ئەمەیە قسەی پیاو! وای لێ ئەکەین.

Cut

دیمەنی – ١٥٨٤ – ش / ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر سەر عەرەبانەو نیگار دانیشتووە.. بروسک و چیمەن و سەلواو ڕێژوان و دەوران و ئامۆ))

زوبێر: ئەزانی بۆ کاتی نییە چاوەکەم؟ من ئەمەوێ وەک من تیاچووم، هەر هیچ نەبێ دایکت ڕاست بێتەوەو کەمێک هەڵپەڕکێکە برازێنێتەوە.. ئەی توخوا نیگەی لێبکەیتە دەرەوە، حەیف نییە کەسێکیتر دەسڕی سەرچۆپی بادا؟

دەوران: ڕاستە، من ئەمویست تۆش ئەوەت بکردایە نەک هەر دایکم.. بەڵام ئیتر زۆر ئەخایەنێ!

ئامۆ: جا تۆ پەلەت چییە هاروهاج؟ ئەمساڵ ناساڵێکیتر هههه.

(( پێکەنینی هەموو))

دەوران: هەی نەیخۆی تاڵە ساڵێکیتر!!!! دایکم دوو مانگیتر عەیب چییە نایمێنێ!

زوبێر: دەی کەواتە با دوو مانگیتر بێ، زۆر نییە.

چیمەن: ئەی بۆ داواکردن و مارەکردنی تەواو نەکرێ و گواستنەوەی بخرێتە ئەو کاتە؟

دەوران: ئەک دایکەکەی دایکم، ئەها خوشک چەند باشە هەتبێ؟

بروسک: ئافەرین، چیمەن هەر زیرەک بووە.

زوبێر: دەی بە دڵی خۆتان بکەن.. من لاریم لە هیچ شتێک نییە.

نیگار: کورە منی بۆ چییە زوبێر گیان؟ تا زووە بچنە ماڵی خۆیان باشترە.

سەلوا: شتی وا نییە، هەر ئەبێ تۆش لە ئاهەنگی کچە تاقانەکەتا بی.

دەوران: دش و براژن قەت ڕێکناکەون، ئەها چەند خراپە هههە خۆ گوێتان لێیە ئەویش چی ئەڵێ؟ براژنە براژن هههە.

ڕێژوان: دەی ئەویش ڕاست ئەکا بەساقەوبم، تۆ دڵت ئەیهێنێ بە بێ دایکت ئەوە بکەی؟

نیگار: ئەو پەلەیەتی و ئێمەش بە هەوای شان قسە ئەکەین.

دەوران(( ئەچیتە لای دایکیەوەو باوەشی پیا ئەکا)): بەخوا هەمووی بۆ خۆشیی بوو دایە گیان، بێ تۆ هیچ شتێک ناکرێ.. تۆ هەموو خۆشیی دنیای منی.

نیگار: قوربانت بم.

ئامۆ(( بۆ بروسک)): چیتکرد بروسک گیان؟

بروسک: پێموتوون دەستوبردی تیا بکەن، خاوەخاوم ناوێ.

Cut

دیمەنی – ١٥٨٥ – ش / ن –ماڵی حەمەخدر:

(( خدرو تریفە))

خدر: ئەبێ من بەیانی بچم بۆ دێکەی خۆمان.

تریفە: جا دێی خۆتان کێی لێیە بۆی ئەگەڕێیتەوە؟

خدر: باوکم و هەرمێلەو غەمگین بێ تاقەت بوون لەو ماڵە تازەیەو بێ ئەوەی پرسم پێ بکەن، گەڕاونەتەوە گوند.

تریفە: جا توخوا ناهەقیانە؟ وا من لێرە خەریکە دڵم شەق ئەبا! باوەڕ بکە ڕێک زیندانێکە بۆ خۆی.. هەڵبەت بەوانیشت وتووە دەرگا لە کەس نەکەنەوە هههە.

خدر: هیچ چارەسەریترم نەبوو بۆ ئەوان، بەڵام تۆ سبەی ئەگەڕێیتەوە بۆ وەکالەتەکەو دایکت ئەچێتە کۆمپانیاکەی ئاوا، سەفەر ئەکەن.

تریفە: بە خۆشییان بێ.. ئەڵێم...... حمەخدر گیان!

خدر: گیانی حمەخدر؟ ئەمرکە!

تریفە: ئەڵێم بۆ من و تۆش سەفەرێک نەکەین؟ با تۆزێ دنیا ببینین.

خدر: کاتی نییە بەساقەوبم، هەندێ کێشە هەیە، بەڵێن بێ گەر چارەسەرمان کرد، ئێمەش ئەڕۆین.

تریفە(( گرژی ناز)): جا خوا ئەزانێ کەی کێشەی تۆ تەواو ئەبێ؟

خدر: خەمت نەبێ، بەرەو کۆتاییەکەی ئەچم.. مادام تۆش داوات هەیە، ئەوە زیاتر پەلەی تیا ئەکەم.

تریفە: قوربانت بم.

Cut

دیمەنی – ١٥٨٦ – ڕ/ د – بەردەم ئۆفیسی وەکالەت:

(( ئارینا گوڵ ئەفرۆشێ))

هاوڕێ(( لێی نزیک ئەبێتەوە)): هێی کچێ! ئەوە چاوەڕوانی کێ ئەکەی لەوێ دانیشتووی؟

ئارینا(( سەرسام و خۆی گێژ نیشان ئەدا)): بۆ؟ چاوەڕێی کەس ناکەم، من گوڵ ئەفرۆشم، گوڵت ناوێ؟

هاوڕێ: بچۆ لە شوێنێکیتر بیفرۆشە دایکەکەم، لێرە نابێ!

ئارینا: بۆ ئێرەو شوێنیترچیاوازیی چییە؟ ئەرز ئەرزی خوایە!

هاوڕێ: نا ئێرە نابێ.. بڕۆ دەی.

ئارینا: دەی چیت لە دەست دێ بیکە، من ناڕۆم.

هاوڕێ(( بۆ عەبەو سەفین)): ئا وەرن کوڕینە!

(( ئارینا هەر کە ئەبینێ دووانیتر هاتن، گوڵەکان هەڵئەگرێت و ڕائەکا))

Cut

دیمەنی – ١٥٨٧ – ڕ/ د – بەرماڵی نارەوەن:

(( خدر وەستاوەو چاوەڕوانی نارەوەنەو سەیارەکەی دڵەو کارەش دوورتر وەستاون.))

نارەوەن(( دێت و سەرئەکەوێ)): بەیانیت باش.. ئەی بۆ سەیارەکەی خۆم نەهێنم؟

خدر: بەیانیت باش.. نا وەرە سەرکەوە.

نارەوەن: ئەی تۆ ناچی بۆ لادێ؟ لەوسەرەوە بەچی بێمەوە؟

خدر: جارێ با بچینە ئۆفیس، لەوێ بیری لێ ئەکەمەوە بچم یان نا؟ لە ڕێ بیرم لێکردەوە، وا بزانم جارێ بە کەڵک نایەت.

نارەوەن: نا ڕۆڵە گیان، بچۆ سەرێکیان لێ بدە، ئێستا تەواو دڵگران ئەبن بزانن فەرامۆشیان ئەکەی، بەخوا ناهەقیان نییە، منیش بم دڵگران ئەبم، خۆ تۆ لەبەر ئیش هەر نەتئەپەرژایە سەر ئەوان.

خدر: تۆ ئاگات لە هەندێ شت نییە، وا پێویستی ئەکرد.

نارەوەن: وا پێویستی ئەکرد، ژن بێنی و باوک و تەنها خوشکێکت هەبێ و لە شارەکەشدا بن، لەوێ نەبن؟ توخوا ئەگەر قسەی سەیر بکەی؟ من زۆریشم لێکردی بە قسەت نەکردم.

خدر: نەمئەویست شوێنیان ئاشکرابێ و هەواڵیشم پێگەیشتبوو، بە تایبەت ئەو شەوە چاودێریی زۆرم لەسەر بوو.

نارەوەن: هەمووی پاساو و بیانووە.

خدر: با جارێ بڕۆین، لە ئۆفیس بڕیار ئەدەم کەی بچم!

نارەوەن: بۆ بە ناخێری گیانت هەڵتوەشاندەوە بچی؟

(( خدر پێکەنین و ئەڕۆن.. سەیارەی دڵەو کارە دوایان ئەکەون))

Cut

دیمەنی – ١٥٨٨ – ڕ / ن – ڤێلای شەنیا – کونە گورگ:

(( شەنیا نوستووەو لاوێن خەبەری ئەکاتەوە))

لاوێن: هەستە درەنگە.

شەنیا: جا ئێمە درەنگ و زوومان کوا؟ لاوێن گیان.

لاوێن: چۆن نیمانە؟ ئەوە ئارینا چووە گوڵەکان بفرۆشێ لای نارەوەنەکە پێش ئەوەی بچێتە سەرکار.. کەچی لەوناوەش پاسەوان و ماسەوان هەبووەو ئەگەر هەڵنەهاتایە، چینێکی باشیشیان ئەکوتا.

شەنیا: ئۆو.. مادام ڕووداو هەیە، درەنگە.. ڕاستە! ئەی ئێستا لە کوێیە؟

لاوێن: لە ناو بازاڕ چاوەڕێی منە.

شەنیا: خۆت چالاکی ئەم بەیانییە یان تاقەتت نییە؟

لاوێن: بۆ چ شتێک؟ هەر زۆر چالاکم.

شەنیا: زۆر باشە.. کەواتە با بچینەوە شارو هەڵدێرو کەیوانیشم بۆ بانگکە بۆ ماڵەکەی خۆمان.

لاوێن: چیت بە دەستەوەیە ئەقڵی گەورە؟

شەنیا: بروسکەیەک بە مێشکما هات، تا ئەگەینەوە شار بیرۆکەیەک گەڵاڵە ئەکا.

لاوێن: ئەی شتێکت بۆ ئامادە نەکەم بیخۆی؟

شەنیا: نا.. کاتی نانخواردن نییە.. لە شار.

(( بە پەلە لە جێگا دێتە دەرەوەو دەست ئەبا بۆ عەلاگەی جل باڕوکە و پانتۆڵ و تیشێرتێک فڕێ ئەداتە سەر سیسەمەکەی و ئەچێ بۆ دەموچاو شتن.

Cut

دیمەنی – ١٥٨٩ – ڕ / د – بەردەمی ئۆفیسی وەکالەت:

(( سەیارەکەی خدر دێت و نارەوەنی لەگەڵدایە، سەیارەی دڵەو کارەش لە پشتەوە ئەوەستێ.. خدرو نارەوەن دائەبەزن و نارەوەن دوای سڵاو ئەچێتە ژوورەوە.. خدر دڵەو کارە بانگ ئەکات و سەفین و عەبەش))

خدر(( بۆ کارەو دڵە)): نیو سەعاتیتر بچن بۆماڵی ئێمەو تریفە بێنن.

کارە: بەسەرچاو.

خدر(( بۆ سەفین و عەبە)): ئێوەش بچن بۆ کۆمپانیاکەی ئاواو کە تریفە هات من و نارەوەن خان دێین بۆ ئەوێ، ئیتر ئەم ماوەیە لە دەرگای ئەوێ ئەبن، خۆتان بە شتێکەوە خەریککەن، وا نەبێ بزانن پاسەوانن.

عەبە: بەسەرچاو قوربان.

خدر: ئەوێ پاراستنی ئاسانترە سەر جادە نییە وەک ئێرە.

سەفین: هەر شوێنێک جەنابت بە ئێمەی بسپێری، لە خزمەتداین.

خدر: دەی دەستتان خۆش.

(( خدر ئەچێتە ژوورەوە))

Cut

دیمەنی – ١٥٩٠ – ڕ / د – پارکێک:

(( ڕەوەزو دلێرو زاهید ))

دلێر: ئەی بۆ هەر خۆم نەچم؟ بۆ ئێوەش باشترە کەستان توش نابن، ئەگەر هەر خۆم بم خۆم قوتار ئەکەم.

ڕەوەز(( گرژو دەموچاوی داوە بەیەکا )): کەرە کەر مەکە هەتیو، کوشتنی هەروا ئاسان نییە.. پێنج شەش پاسەوانیان بۆ داناوە ئەوەندەی بینیومانن، خوا ئەزانێ چەندی تریش هەن و خۆیان دەرناخەن؟ .. ئیشەکە ئەبێ بە ئەقڵ بکەین، وابێ کەس توشی کێشە نەبێ.

زاهید(( مەبەستی دلێرە )): ئەگەر تەنیابێ، پێش ئەوەی دەمانچە هەڵکێشێ، پاسەوانەکانی ئەیکوژن.. ئەوە نابێ، ئەبێ یەک دوویەک پاسەوانەکان سەرقاڵی خۆیان بکەن.

ڕەوەز: نە بابە تەنیای چی؟ لە پێنج کەس کەمتر بین سوودی نییەو هیچمان پێ ناکرێ.

زاهید: ئەی خۆ چوارین؟!

دلێر: ئەگەر پێویستیتان بە کەسیتر هەیە، من برادەری دڵسۆزم هەیە، پێی بڵێم بمرە ئەمرێ.

ڕەوەز: نە بابە هەیە، جارێ پەک نەکەوتووە.

زاهید: بە قسەی من بکەی بیهێنێ باشترە.

ڕەوەز: ئەگەر وەک خۆت وایە؟ با بێ!

دلێر: لێی مەترسە، زۆر بەدەستە.

Cut

دیمەنی – ١٥٩١ – ڕ / د – ناو بازاڕ:

Mute

(( ئارینا وەستاوەو تەماشای سەعات ئەکات و چاوەڕوانە.. پاش کەمێک لاوێن دێت و ئەکەونە ئاماژەکردن و دیالۆگ.. پاشان ئەڕۆن))

——————— Cut ———————

دیمەنی – ١٥٩٢ – ڕ/ د – گوند:

(( لە کێڵگەیەکدا یان دارستان، یان سەرچەمێک.. مریەم و عارف و دیدەوان و ساماڵ و هەوراز دانیشتوون))

مریەم: ئەو پارەیە زۆر کەمە.

دیدەوان: جا ئەگەر لوتف بفەرموویت و بە قەرزیش بێ، یان بە هاوبەشیی بۆمان تەواو بکەی، زۆر مەمنون ئەبین.

مریەم: ڕاستییەکەی من ناتوانم پارەیەکی وا قەبە، بە ئاسانیی بخەمە ئاوەوە.. ئێوە ئەزانن ئاسایش چۆن بەدوایا ئەگەڕێ.. خوانەخواست هەر شتێک ڕووبدا، من بە چی ئەو پارەیەم دەست بکەوێتەوە؟ بە ڕاستی ئەو یارییە ترسناکە ناکەم، ببورە کاک دیدەوان.

عارف: ئەتوانین شتێک زیادی بکەین.

مریەم: ببورە چاوەکەم، مەسەلە شت نییە، ئێوە باسی ٤٠% ئەکەن کە بەدەستتانەوە نییە، وا توانیت ٥% ی تریش جۆرکەی.. ئەی ئەویتری؟ بەڵام من چارەسەرێک شک ئەبەم بۆ ئەمجارە.. بەڵام دووبارە بێتەوە، هەموو مامەڵەیەک لەگەڵ تۆ ڕائەگیرێ کاک دیدەوان.

دیدەوان: نا دڵنیابە، بۆ جارێکیتر پارەکە ئامادە نەبێ باسی هیچ ناکەین.. ئەمجارە بەهۆی هەندێ کێشەی خۆمانەوە بۆمان ئامادە نەکرا.. چارەسەرەکەت چییە مریەم خان گیان؟

مریەم: خۆم کڕیار شک ئەبەم و هەر خۆشیان ئەنێرم بچن بیهێنن و لە ناوچەکەش بیبەنە دەرەوە.

دیدەوان: وەی قوربانت دادەکەی من، بەڕاستی باش فریامان ئەکەویت.. ئێمە کەی پارەکەی خۆمانت بدەینێ؟

مریەم: ئۆو باش تێنەگەیشتی کاکە.. ئەمە ئیشەو هەمووی بە مەترسیی چنراوە.. من کە خۆم ئیشەکە بکەم، ئێوەی تیا نیین ببورە.

عارف: ڕاستە.

دیدەوان: نا بەو جۆرەش دڵڕەقیی باش نییە مریەم خان.. هیچ نەبێ ئیشەکە لە سەرەتاوە بەناوی ئێمەوە بووە.

مریەم: مەبەستت چییە؟ خۆ نابیتە شەریکەبەشم؟

دیدەوان: ئەگەر بە ڕێژەیەکیش بێ هەر وا جوانترە ئێمەش بە شتێک بەشدار بین.

مریەم: ئەی ئەگەر کاروانەکە گیرا؟

دیدەوان: حاڵی ئێمەش وەک تۆ.

مریەم: بەڵام ئەوانیش خەرجیی زۆریان ئەکەوێتە سەرو کار ئەکاتە سەر قازانجی منیش، هەر هیچ نەبێ ئەبێ گروپێکی شارەزا بدۆزنەوە، خۆ خۆیان شارەزای ئەم ناوچەیەی ئێمە نیین.. هەموو شتێکیش بە پارە ئەکرێ.

دیدەوان: جا با بیدەن بە گروپەکەی ئێمەو ئەو پارەیەش نەچێ بە لایەکیترا.

مریەم: ڕاستییەکەی سەرمایەکە زۆر گەورەیە کاک دیدەوان، ناخرێتە بەردەستی گروپێک لەناو خۆیانا کۆک نەبن.

Cut

دیمەنی – ١٥٩٣ - ڕ / د – ناو سەیارەی هەستیی:

(( هەستیی و دەوران))

دەوران: دە ئیتر وام لێ مەکە بڵێم تا باوکیشم چاک نەبێتەوە، نەیەیتە پێشەوە.

هەستیی: ناشرین، جا ئەو قەت چاک نابێتەوە.

دەوران: دەی ئیتر کوڕی ئاقڵ زوو تێئەگا.. من هیچ پەلەم نییە، بە کاوەخۆ!

هەستیی: تۆ شێتم ئەکەی!

دەوران: بۆ ماوتە؟! هاهاها.

هەستیی: بۆ نەچین لای تیرۆژ دانیشین؟

دەوران: ئەی ئیش و کارمان؟

هەستیی: چش.. با نەکرێ، خۆ نامرین لە برسا؟.. من چاوی تۆم لێ دیار بێ ئیشم هەر ناوێ.

دەوران: جا کێ ئەڵێ منیش وام ڕۆڵە؟!

هەستیی: من ئەڵێم.. زۆر دڵنیاشم لە من زیاتر پەلەتە، بەڵام ناتەوێ خۆت دەرخەی.

دەوران: پەلەشم بێ دەسەڵاتم چییە؟ باشتر وایە ئۆقرە بگری هەستیی.. هەموو شتێک کاتی خۆی هەیە.

هەستیی: من ئاگاداری کات نیم و هیچیشی لە بارەوە نازانم.

دەوران: ئەها.. دەی من با تێتگەیەنم کات چییە.. کات بریتییە لەو ڕیتمە دەروونییەی هەر یەکێک لە ئێمە لە چاوەڕوانیدا هەیەتی.. کات بریتییە لە یەکەمین چاو هەڵهێنان بە دەوروبەرتاو ئەویش هێواش هێواش گەورەت ئەکاو دواتر بێ ئەوەی بە خۆت بزانی، هەمووی تێئەپەڕێ و ئەمریت.. کات شایەتی یەکەمی خۆشیی و

ناخۆشییەکانتە.. کات ڕاگرتنی نییە، دەست تێوەدانی نییە، شەرمی نییە، پرسیارت پێ ناکاو بەدڵی خۆی ئەڕوا.

هەستیی: نەتزانی.. من باشتر پێناسەی ئەکەم.

دەوران: ئادەی تۆ پێناسەیکە عاشقە بێ کاتەکە.

هەستیی: کات گوناحە هیچی نەکردووە تا بیکوژین.. وا گەیشتینە ئۆفیسەکەی تیرۆژ، سوپاس بۆ کات کە چاک خەیاڵی بردی و نەیهێشت بڵێی با نەچین، فەرموو دابەزە، من سەیارەکە ئەبەمە ئەو گەراجەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٩٤ – ڕ / د – بەردەرگای ماڵی هەندرێن:

(( ڕێبوارو تافان))

تافان: ڕێبوار پێموتی نەیەی بۆ ئێرە.. وا مێردەکەم لە پڕا هاتەوە؟!

ڕێبوار: ئەی کە تەلەفون وەڵام نەدەیتەوە چی بکەم؟

تافان: پێموتی نامەوێ ئیش بکەمەوە، بەڕاستیی دوو منالْم هەیەو نامەوێ سەرکێشیی بە ژیانی کەسەوە بکەم.

ڕێبوار: نا نا ئەمجارە سەرکێشیی تیا نییە.. ئیشەکە بۆ کاک ڕەوەزەو ئەڵێ زۆر دڵنیابێ وەک خوشکێکی خۆم ئەیخەمە ئیشەوەو ئەشیپارێزم.

تافان: تکایە تۆ ئەوەندە لەبەردەرگا مەوەستە!

ڕێبوار: ئەی بچینە ژوورەوە؟

تافان: ژوورەوەی چی بەقوربان؟ بۆ سەریشم بە تاشین نادەی؟

ڕێبوار: ئەی چی بکەین؟

تافان: ئێستا برۆ با بیرێکی لێ بکەمەوە.. هەرکاتێ گەیشتمە قەناعەت، تێلت بۆ ئەکەم و لە شوێنێک ئەتبینم.

ڕێبوار: باشە گیان، ئەوە بزانە ئیش لەسەر تۆ پەکی کەوتووە.. وا بکە زوو وەڵامم لێ بگێڕیتەوە.

(( خواحافیزیی و ڕۆشتن))

Cut

دیمەنی – ١٥٩٥ – ڕ / د – بەردەمی ئۆفیسی وەکالەت:

(( دڵەو کارەو هاوڕێ بە پێوەن))

کارە: ئێمە ئەچین بەدوای تریفە خاندا ئەگەر هەواڵی پرسین.

هاوڕێ: تا دەرەنگی نەکردووە، بڕۆن.

(( دڵەو کارە ئەڕۆن و پاش کەمێک هەندرێن داوای چا ئەکات بۆ شوێنەکەی و هاوڕێ چا تێئەکات و ئەیبات.. لاوێن و ئارینا دێنە بەردەمی ئۆفیسەکەو کەمێک چاو ئەگێڕن و ئەچنە ئۆفیسەکەوە))

——— تابع ——— Cut ———

دیمەنی – ١٥٩٦ – متبوع – ڕ / ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن لەسەر قەنەفە دانیشتوون و لاوێن و ئارینا دێنە ژوورەوە))

خدر: فەرموون!

لاوێن: ئێوە کێن تا خەڵک بنێرن لە خوشکی من بدات؟ چی کردووە؟ لێی بدرێ، ئەو لەسەر شەقامەکە گوڵ ئەفرۆشێ، هەموو گوناحەکەی هەر ئەوەیە.

خدر: ئەوە باسی چی ئەکەی بابە گیان؟ من ئاگام لە شتێکی وا نییە.

ئارینا: با ئاگاتان لێیە، ئەو پیرێژنە وتی بچن لێیدەن!

(( نارەوەن هەڵئەسێ و خدر بەدوایا.. لاوێن لە نارەوەن نزیک ئەبێتەوە))

لاوێن: من ئێستا پۆلیستان بۆ بانگ ئەکەم، بزانین شاری بێ حاکمە وا هەرکەسێ هەڵسێ و خەڵک بداتە بەر زللە؟

نارەوەن: ئەوە ئێوە چیتان ئەوێ کچینە؟ من بە کێم وتووە لێتدا؟

ئارینا: با ئاگام لێبوو تۆ بووی.

خدر: من ئێستا پۆلیس بانگ ئەکەم نەک تۆ بە قوربان، بزانم گەڕی چیمان پێ ئەکەن؟ .. ئەو ژنە خۆم هێنام بۆ ئێرەو کەسیشمان نەبینیوە لێی بدرێ.. ئێمە مەحاڵە ..........

(( خدر تەرکیزی زۆر ئەکا.. لە کاتی قسەکانیا ئەبینێ لاوێن چەقۆیەکی کەمێک گەورە لە پشتییەوە دەرئەهێنێت و ئەیەوێ بیکا بە سەر دڵی نارەوەندا))

# (( ئەڵقەی حەفتاو شەش))

خدر(( سەرنجی لەسەر چەقۆکەیە.. قسەکەی ئەبڕێت و توند مەچەکی لاوێن ئەگرێ)): ئەوە چی ئەکەی بێ نامووس؟ ئەو چەقۆیە فڕێدە.. ئەتکوژم.. داینێ!

نارەوەن(( قژی ئەگرێت و لاوێن چەقۆکەی هەر بەدەستەوەیە)): فرێیدە چەتیو.. ئەوە بۆ ئەمە هاتبوون؟

خدر(( بە دەسرێکی کلێنس ئەیەوێ چەقۆکەی لە دەست وەرگرێ)): وتم بە ئاسانیی چەقۆکەم بدەرێ، دڵنیابە ڕزگارت نابێ، با نەتکوژم.

ئارینا(( بە توندی پاڵ بە خدرەوە ئەنێت و ئەکەوێ بەسەر لاوێن و نارەوەندا، مەچەکی لاوێن بەرئەدا.. لاوێنیش زیاتر پاڵ بە نارەوەن و خدرەوە ئەنێت و خۆی ڕائەپسکێنێ)): ڕاکە لاوێن.

(( هەردووکیان ڕائەکەن و تا خدر ڕاست ئەبێتەوە، ئەوان لە دەرگا ئەچنە دەرەوەو خدر دوایان ئەکەوێت))

تابع —————— Cut ——————

دیمەنی – ١٥٩٧ – متبوع – ڕ / د – بەر ئۆفیسی وەکالەت:

(( لاوێن و ئارینا بە ڕاکردن دێنە دەرەوەو سەیارەیەک وەستاوە شەنیا[٢] و کوڕێکی تیایە.. هەردووکیان بە ڕاکردن دێن و کوڕە دەرگایان بۆ ئەکاتەوەو ئەوانیش خۆیانی تێ فڕێ ئەدەن و پێش دەرگا داخستنەوە سەیارەکە دەرئەچێ.. خدر دەمانچە هەڵئەکێشێت، بەڵام خەڵک دەرئەکەوێ و ناتوانێ تەقە بکات.. هاوڕێ بە ڕاکردن بەرەو لای خدر دێت))

هاوڕێ: ئەوە چی بوو کاک حەمەخدر؟

Cut

دیمەنی – ١٥٩٨ – ڕ/ن – ماڵی هەندرێن:

(( تافان تێل ئەکات و وەڵام نادرێتەوە ))

تافان: ئەبێ بۆ وەڵامم نەداتەوە؟.. تۆ بڵێی ئەویش پشتی تێکردبم؟ خۆ خۆی وتی هەرکاتێ تێلت بۆ کردم هەر ئیشێکم هەبێ، ئەوی تۆ لە پێشترە.. ئەی لەم کابرایە**!!؟** تۆ بڵێی نیازی چی بێ بە من؟.. خۆ ئیتر کەس سەر لەم خەڵکە دەرناکا، ئەوە دووجار زەنگی بۆ ئەکەم و وەڵام ناداتەوە.. شەرتبێ بۆی نەکەمەوە.

Cut

دیمەنی – ١٥٩٨ – ڕ / د – گوند:

(( دیدەوان و ساماڵ و عارف و هەوراز))

عارف: ئیتر تەواو.. ئەوە نیشانەی هەڵوەشاندنەوەمانە.

دیدەوان: لەوە زیاتر چی؟ من تا ئێستای تەمەنم هێناوە، ئیشی وا بێ سەرەوبەرەم نەکردووە.. هەر کەسێ هەڵئەسێ و خۆی لێ ئەبێ بە گوندە.. ئەوەتا نە ئیشێکمان پێ ئەسپێرن و نە خۆشمان پارەی ئیشمان هەیە.. مەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاو وردە ئیش دەست پێ بکەینەوە.

عارف: کەواتە با بڵاوەی لێ بکەین و کە زانییان یەکتر نابینین، مەترسیی کوشتنیشمان لەسەر نامێنێ.

دیدەوان: وا نییە.. نە بڵاوەی لێ ئەکەین و سەری خۆمان کز بگرین.. نە کۆڵیش ئەدەین.

عارف: ئەی چارەسەر؟

دیدەوان: من نامەوێ لە سفرەوە دەست پێ بکەمەوە، هەرچی هێڵی سوورە ئەیبەزێنم بۆ ئەوەی بگەمەوە بە سامانە گەورەکە.. سامال کەست پێ پەیا ئەکرێ؟

سامال: بەڵێ گەورەم.

دیدەوان: دە کەسم پێویستە.

سامال تۆ بڵێ سەد.. بەڵام لێرەوە پێم ناکرێ.

دیدەوان: نەخێر ئێرە تەواو.. هەر ئەمشەو ئەچینەوە شارو شەنیاو مەنیاش ئەدۆزینەوەو نامەوێ ئیتر بەزەییمان بە کەسدا بێتەوەو لێبوردە بین.. هەموو ناپاکێکیش بە دەستی خۆم ئەکوژم.

سامال: فەرمانی تۆیە گەورەم.

عارف: بە نیازی چیت؟

دیدەوان: کە چووینەوە شار، چەند دزییەکی گەورە ئەکەین، تا سامانێک کەڵەکە ئەبێت و بە هێزەوە لە نۆژەن تێهەڵئەچینەوە.

عارف: ئا.. وا ئاسان ئەبێت؟

دیدەوان: هەوڵی ئەوێ.. برادەرێکم هەیە، کاتی خۆی ئیشی لەگەڵ ئەکردین، زۆر وریایەو ئەو ئەم گروپەی گەیاندە ئەوەی سامانی گەورەی هەبێ.. هەوڵ ئەدەم ئەویش بێنمەوە ناو ئیشەکە، ئەوسا ئەبینی لە مانگێکدا ئەگەینەوە کوێ؟!

هەوراز: بەس توخوا با بڕۆینەوە، گەڕ بووم لێرە.

ساماڵ: دە تۆ سەیریکە خەمی چییەتی؟

Cut

| | |
|---|---|
| دیمەنی – ١٥٩٩ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:<br>(( بەهێز تەلەفون ئەکا ))<br>بەهێز: ١- بەڵێ دڵنیابە کاک حمەخدر، مەفرەزەیەکی فریاکەوتن لەو دەوروبەرە نزیک ئەخەمەوە وابێ چاویان لێتان بێ......... ٢ – نایکەن بە سکاڵا؟ .................. ٣- باشە بەدڵی خۆتان.. هەر ئێستەش مەفرەزەکە داوا ئەکەم ........... ٤- سوپاس بۆ تۆش.<br>Cut | دیمەنی – ١٦٠٠ – ئۆفیسی وەکالەت:<br>(( خدرو نارەوەن وەک تازە گەڕابێتەوە، هەناسەسواریی و تێل ئەکا ))<br>خدر: ١ – سوپاس کاک بەهێز گیان، ئەوکاتە وام پێ باش بوو دەرنەکەوین، ئێستاش پێشنیازەکەی جەنابت جوانە، دووربن و ئۆفیسەکەیان لێ دیار بێ، ئەوە زۆر باشە................. ٢- نەوەڵا ئاسەواری تاوانەکەشیان جێهێشتوە، بەڵام با نەزانن هانامان بردۆتە بەر پۆلیس، لەم کاتەیا باش ناکەوێتەوە ........... ٣- زۆر سوپاس. |

(( خدر مۆبایلەکە دائەخاتەوە ))

خدر: با تەلەفونێکیش بۆ تافان بکەم، دووجار زەنگی کردووە.

نارەوەن: جا توخوا ئێستا وەختی تافانە؟

خدر: ئا ئا، نەک لەوێش شتێک ڕوویدابێ.

(( مۆبایل هەڵئەگرێت و تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٦٠١ – ڕ/ د – گوند:

(( مام تەیفور لە شوێنێکی گونددا لەگەڵ کەسێک وەستاوە ))

تەیفور(( بێزار)): جا برا ڕۆژەکەی وای لێهاتووە، خۆ ناوێری زیاد لە پێویست ڕوو بدەی بە یەکێ، خێرا کۆمەڵێ لۆزەندەر ئەهێنێتە سەر ورگت و چاوەڕێش ئەکا خزمەتیان بکەی.

کەس: بەخوا باقڵم خەریکی کاری گەنن، هەروا دێن و ئەچن و کەس تێیان ناگا.

تەیفور: کورە داوای هەنێ کوڕی جەربەزەی ئەم دێیانەشی لێ ئەکردم.

کەس: ناشێ ئەوەشت کردبێ؟

تەیفور: نەبابە ئەوە من نیم، کێ ناڵێ بۆ پیاوکوشتن و دزیی و ڕاوەڕووتی نییە، چۆن خۆم ئەخەمە ژێر باری ئەو شتانەوە، ئەی دوایی ئەگەر خوانەخواست شتێ ڕوویدا، بە چ ڕوویەکەوە بچمەوە بەردەمی کەسوکاریان؟ نەوەڵا قەت شتی وا ناکەم.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٢ – ڕ/ن – ماڵی تازەی شەنیا – ژوورێک:

(( شەنیاو گوڵزارو سەرچڵ))

شەنیا: نا سەرکەوتوو نەبوون، ئێستا خۆم بردمنەوە بۆ ماڵی لاوێن.

سەرچڵ: چییە ئەو پیرێژنەمان لێ چۆتە سەر کێوی ئاسی؟

گوڵزار: کاکە خەڵکی زۆری بەدەورەوەیە، ئەوەیە مەسەلەکە.

سەرچڵ: ئەگەر پیاو کارامە بێ، ئەزانێ چۆن ئیشی خۆی ئەکا، بەڵام ئەوان مناڵن، داماوانە چی ئەزانن لە کوشتوبڕ.

شەنیا: تۆ ئەوەت پێ ئەکرێ؟ تازە بووە بە ماخۆلانی سەرم، هەر ئەبێ بکوژرێ، ئەگەر خۆشم تیا بچم.

سەرچڵ: ئاسانە، ئەمجارەیان لێیگەڕێن بۆ خۆم.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٣ – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین و ڕاهۆز))

ڕاهۆز: نەخێر گەورەم نەناسراو بوون، بەڵام یەکێکیان ناوی لاوێن بووە ئەگەر خوازراو نەبێ ناوەکە.

سەرکۆ: لە دوو سێ لاوە هەوڵی کوشتنی ئەو ژنە ئەدرێ، لەو باوەڕەدا نیین هەست بەوە کرابێت کە سەر بە خۆمانە؟

ڕاهۆز: نەخێر گەورەم، هەستی پێ نەکراوە سەر بە خۆمان بێ، لە هەردوولاوە ڕق لێبوونەوەیە، شەنیا بۆئەوەی گورزێک لە ئامۆ بوەشێنێ، کە دایکی زۆر خۆش ئەوێ و دیدەوانیش تۆڵەی خۆی لێ ئەکاتەوە، کە لە بەردەمی خدردا زۆر خراپ شکاندوویەتی و تفی تێکردووە.

کۆژین: جا کەواتە بە ڕاستی ژیانی لە مەترسیدایە.

سەرکۆ: بەڵێ ئێستا ڕوونە.. بە تایبەت دوای ئەو ڕووداوەی ئەمڕۆ.. هیچتان کردووە بۆ پاراستنی، نەقیب ڕاهۆز؟

ڕاهۆز: گەورەم کاک حەمە خدر شوێنی هەموو ئاسایشە نهێنییەکانی ئەو دەوروبەرەی دیاریکردووە، ئەمڕۆش ئەو کچانە هەلی ئەوەیان قۆستۆتەوە، کە کاک حەمەخدر ئیشی پیا داداون و لەوێ نەبوون.

کۆژین: ئۆو کەواتە بەردەوام ئەوانیش چاودێریی ئەو ناوچەیە ئەکەن.!

سەرکۆ: بەڵێ ڕاستە.. بەڵام حەمەخدریش وریایە.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٤ – ڕ/ د – گوند:

(( سەیارەی دێ و دیدەوان و ساماڵ و عارف و مام تەیفور وەستاون.. مام تەیفورو دیدەوان ئەچنە لایەکەوە ))

دیدەوان: مام تەیفور ببورە ئەم میوانانەشم لەگەڵ خۆم هێنا بوو، ئیشەکە وا پێویستی ئەکرد.

تەیفور: ئێوەش لە قسوری ئێمە ببورن مامۆستا دیدەوان، بەڵام ئیتر خۆ دێکە هەر منی تیا نییم.. ڕاستییەکەی ئەگەر بە ڕەزامەندیی هەموو خەڵکی دێ نەبێ، پێیان خۆش نییە غەریبە بێت و لێرە بژی.

دیدەوان: ئیتر ناچاریی بوو مام تەیفور، زۆر باش هەستمان پێکردبوو، لە نێوانیشمانا دەرنەچێ، کەمێ سارد بوویت.

دیدەوان: ئیتر ئەوەی منیش هەر ناچاریی بوو، لەبەر خەلکەکە، ئەیانوت تۆ جێت کردوونەتەوە.. بە ڕاستیی زۆریان پێ ناخۆش بوو.. تکایە با دووبارە نەبێتەوە.

دیدەوان: بەسەرچاو دووبارە نابێتەوە.. بەڵام ئەبووایە زووتر پێت بوتینایە.

تەیفور: وەڵا خۆ ئەگەر ئەمڕۆ نەڕۆشتنایە، شەوێ لەگەڵ سێ چوار پیاو ئەهاتینە خزمەتتان.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٥ – ڕ/ن – ئۆفیسی وەکالەت:

(( خدرو نارەوەن و تریفە))

خدر: لە هەوڵی ئەوەدام ئیشەکانیان لە گەڵدا ڕێکخەمەوە.

نارەوەن: جا ئەکرێ؟

خدر: هەوڵێک ئەدەم لەم یەک دوو ڕۆژەیا بۆم دەرکەوێ ئەو لاوێنە سەر بە شەنیایە یان نا؟ ئەوەم دەستکەوێ هەموو شتێک ئاسانە.. (( بۆ تریفە)) ئەگەر تۆ دەسکاریی چەقۆکەت نەکردایە، بە پەنجەمۆرەکەی زووتر ئەماندۆزییەوە.

تریفە: جا من چوزانم؟

خدر: دەی ئاساییە، ئەیدۆزمەوە کێشە نییە.. بەڵام ترێ گیان ئیتر بۆت دەرکەوت چی ئەگوزەرێ، لەبەرئەوە بە بێ پرسی من تا لای هەندرێنیش ناچیت، نەک دەرەوە.

تریفە: کورە هەر ناوێرم سەربەرمە دەرەوە داوای چایەکیش بکەم، ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟

نارەوەن: ئەی منالەکانیتر.

خدر: خەمی خۆتت بێ جارێ، ئەوان ناویان لە ئارادا نییە.. هەستە با بچینە ئەوبەر بۆ لای ئاواو نینا.. بەڵام با کەسیتر بەم ڕووداوە نەزانێ.

(( نارەوەن هەڵئەسێ))

Cut

دیمەنی – ١٦٠٦ – ڕ / ن – ماڵی شەنیا / شار:

(( سەرچڵ و شەنیاو گوڵزارو لاوێن و ئارینا ))

سەرچڵ: ئەبێ ڕەوەز لە ناخافڵا بکوژرێ، ئەگینا هەر دەست بکاتەوە، چارەسەری نییە. بەدەستە!

شەنیا: تۆ لە کوێ بینیت؟

سەرچڵ: جارێک لە چاخانەیەکدا چوارپێنجێکی لەگەڵ بوو، جارێکیتریش لە بازاڕی چەکفرۆشەکان دووانی لەگەڵ بوو.. من خۆم لێ دزینەوە.

گوڵزار: منیش ئەزانم ئاگای لە خۆی بێ هیچی لەگەڵ ناکرێ.. ڕەنگە بڕوا نەکەن چەند بە ئاسانیی فێری پیاوکوشتنی کردم، هەروەک ئاوخواردنەوەش ئاسانە بەلایەوە.

شەنیا: کەواتە خدرمان پێویستە، ڕەوەزیشی پێ بەکوشت ئەدەین و پۆدرەکەش هەر بە خۆی ئەکەین.

ئارینا: وایە ئەو کابرایە دیقەتی تیژە، هەر نەمانزانی چۆن مەچەکی لاوێنی گرت.

لاوێن: من هەستم کرد چاوی لەسەر من نەبێ، بۆیە چەقۆکەم زۆر بە وریایی دەرهێنا، منیش نەمزانی لە کوێوە بینیی و ئامبازم بوو.! ئەگینا پلانەکەی تۆ ئەو ژنە بەرازەی لە کۆڵ کردبووینەوە.

سەرچڵ: خۆ پێموتن ئەو ژنە لێگەڕێن بۆ من.. بە قسەتان نەکردم.. وروژاندتان.

شەنیا: کێشەم ئەو ژنە نییە، هەرکەس بۆی هەڵکەوت لەناوی بەرێت.. کێشەم ڕەوەزە داردەستی دیدەوانەو ئەشبێ بە ڕێگرمان.

گوڵزار: ئەی چی ئەکەی ئەقڵی گەورە؟

شەنیا: لاوێن، تۆو ئارینا نابێ بە هیچ جۆرێک خدرو ئەو ژنە ببینن.. ئەم دەرفەتە ئەبێ باش بقۆزینەوە.

سەرچڵ: چۆن؟

شەنیا: لە ڕێی تافانەوە لەگەڵ خدرا دائەنیشم و ئەڵێم ئەو هەواڵەم بیستووەو ئەم دانیشتنە تەنها بۆ ئەوەیە کە پێت بڵێم ئەو دوو کچە لای ڕەوەز ئیش ئەکەن و ئەو کردوویەتیە سەرتان.

گوڵزار: ئەک ئافەرین، ئەوەیە ئەقڵ! بە تیرێک دوو نیشان.

شەنیا: مادام ئارینا ناوی لاوێنی بردووە لەوێ.. پێی ئەڵێم کچەکان یەکێکیان ناوی لاوێنەو ئەویتریش پەیمان.. بەوەش متمانەی تەواوی لا دروست ئەبێ.

سەرچڵ: ڕەوەزیش کێ ڕایسپاردووە؟

گوڵزار: تەبعەن دیدەوان.

شەنیا: وەک ئاگادارین ئێستا یەکتر نابینن.. ئەڵێم ئەوەشی بۆ ئەوە کرد تا فشارت بخاتە سەرو ئیشی بۆ بکەی.

لاوێن: ئەی کە هات و ئیشی لەگەڵ کردین؟

شەنیا: تۆ بڵێی ئەوەندە داماو بم بهێڵم لە خەویشا بتانبینێ؟

Cut

دیمەنی – ١٦٠٧ – ش/ن – ماڵی دیدەوان لە شار:

(( دیدەوان و ساماڵ))

دیدەوان: ساماڵ گیان ئیتر خۆت ئەزانی تۆ پشت و پەناو یەکە باوەڕپێکراوی خۆمی.

ساماڵ: بەو متمانەیەت گەورەم ئەکەی سەرۆک گیان.. من لە خزمەتدام.

دیدەوان: ئیتر ئەبێ بزانی، هەر بەو متمانەیەشەوە تەماشای سەرخێڵ ئەکەم، ئەویش لەسەر قسەی تۆ.. زۆر دڵنیای لەو کوڕە؟

ساماڵ: گەورەم وەک وتم، سەری پێ بسپێرە، باوەڕ بکە لە برا زۆر شیرینترو ئەمینترە.. هەرچیم هەیەو نییە ئەو کوڕە ئاگاداریەتی، وا بزانە خۆمم، هیچ جیاوازیمان مەکە. تا خوا حەزکا باشە.

دیدەوان: زۆر باشە، ئێستا دڵنیاتر بوومەوە.. چونکە سبەی شتێکتان پێ ئەڵێم، کە تا ئێستا لەم گروپەدا هیچ کەسێک نایزانێ.

ساماڵ: گەورەم هەرچییەک بێ، ئێمە سەرمان لەڕێتایە.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٨ – ش / د – گەراجی سەیارەی ناو بازاڕ:

(( ڕەوەزو دلێرو ڕێبین و زاهید ))

ڕەوەز(( بۆ ڕێبین )): باشە لە ئێستاوە هەرچییەک هەبوو بە دلێری ئەڵێین و ئیتر تۆ لەژێر فەرمانی ئەوا ئەبی.. با پێشت بڵێم بەحاڵ پێ خوار دابنێی، وات لێ ئەکەم خۆت نەزانی کام پێیەت بوو کە خوارت دانابوو.. نامەوێ دلێر هیچ سکاڵایەکی هەبێ.

ڕێبین: کێشە نییە خۆمان ڕێک ئەکەوین.

ڕەوەز(( زللەیەکی توندی لێ ئەدا )): خوێڕی.. هەرچییەکم وت ئەبێ بڵێی ئەمرەکەی، ئیتر خۆتان ڕێک ئەکەون چییە؟ لێرە گەورەو بچوک هەیە، خۆ لاکۆڵان نییە.. دلێر گەورەتەو تۆش ملکەچی ئەبیت، ئەویش هەرچییەکی پێوتی، پێی ئەڵێی ئەمرەکەی.

ڕێبین(( دەست بە ڕومەتیا ئەهێنێ )): ئەمرەکەی گەورەم.

زاهید: جا با یەک ئامۆژگاریشت بکەم هەتیو!

ڕێبین: ئەمرەکەی گەورەم.

زاهید: لە بەردەمی هیچ کەسێکیشا ئاوا ڕووبەڕوو ناوەستی کە خۆشدەست بیت بۆ زللە پیاکێشان و قنگیش ناکەیتە کەس بۆ شەق جوان وەستابی.

ڕێبین: ئەمرەکەی گەورەم.

زاهید: بە شەرەف ئەوەندە خۆش وەستابوو بۆ زللەکە، منیش بوومایە بیانوویەکم هەر پێ ئەگرت تێی سرەوێنم.

دلێر: لە خزمەتداین گەورەم.

ڕەوەز: دەبڕۆن مل بشکێنن، ئەمشەو هیچ ئیشم پێتان نییە.. سبەی لە چاخانەکە دەرکەونەوە یان تەلەفونت بۆ ئەکەم دلێر.

دلێر: فەرمانتە گەورەم.. (( ئەڕۆن ))

زاهید: کە بەرازی!!! ههها ئەویشت چاوشکێن کرد؟

ڕەوەز: ئەوە ئیتر تا ماوە ناتوانێ تەماشای ناوچەوانمکا هەهە.. هەر بۆ خۆشیی پیاما کێشا.

(( ڕێبوار دێت و سڵاو و وەڵامی ساردو لە ڕەوەزەوە))

ڕەوەز: چیت لەو ژنە کرد نەهات؟

ڕێبوار: کاکە ڕەوەز جارێ تۆقیوە.. ماوەیەکی ئەوێ تا هێور ئەبێتەوە.. بەڵام ژنێکیتر هەیە، لە مێردەکەی جیابۆتەوەو لەگەڵ دایک و باوکی ئەژی.. ناوی سوعادەو تەمەنی نزیکەی ٣٥ساڵێک ئەبێ.

زاهید: گرنگ ئەوەیە تێی بگەیەنیت، ئیشەکەمان مەترسییدارەو ئاگای لە خۆی نەبێ تیائەچێ.

ڕێبوار: هەموو شتێکم پێوتووە.. ئەو پارەی ئەوێت و هیچیتر.

Cut

دیمەنی – ١٦٠٩ – ش/ن – ماڵی زوبێر:

((نیگارو زوبێر ئاییادی پێیەو سەلواو دەوران خەریکی مۆبایلەو گوێی گرتووەو چیمەن، خەریکی مناڵەکەی))

زوبێر: جا لە سیستمی سەرمایەدا پارە ئەکەوێتە پێش هەموو شتێکیترەوە.. لەبەرئەوەی بەدەستهێنانیشی زەحمەتە، خەڵک سەرکێشیی بۆ ئەکا، جاری وا هەیە کارەساتی گەورەی لێ ئەکەوێتەوە.

چیمەن: ئینجا خەڵک تەفرە دان و کەڵەکبازیی و ساختەچێتیی و........

زوبێر(( قسەی ئەبڕێت)): بۆ نمونە لەسەر قسەکەی چیمەن.. جوڵانەوەو ڕێکخراوی بەهێز دروست ئەکرێ لەسەر بنەمای باوەڕێک، کە سەرکردەکانی خۆیان باوەڕیان بە بنەڕەتەکانی باوەڕەکە نییە، بەڵام ئەزانن زۆر بە ئاسانیی خەڵکی پێ فریو ئەدەن و سەرمایەیەکی گەورەشی پێ پەیا ئەکەن.. وەکو داعش.. زۆریتریش هەن.

سەلوا: جا خۆ مامە نەخۆشخانەکەی ئێوەش کارکردنی بۆ دەسکەوتنی سەرمایەیە.. ئەی چۆن ئەمەیان حەڵاڵەو ئەوەیتریان حەرامە؟

زوبێر: ئافەرین سەلوا.. بەڵام ئێستا ئێمەش لە سەردەمی سەرمایەدا ئەژین و بەهەر شێوەیەک بێ ئەبێ کەڵەکەی بکەین، سەردەمەکە ئەوە ئەخوازێ کچم.

نیگار: بەڵام خۆ ئێمە نە پیاو ئەکوژین و نە خەڵک هەڵئەخەڵەتێنین و نەشەڕ هەڵئەگیرسێنین.. لەبەرئەوە ئەوەی ئێمە حەڵاڵەو ئەویتر حەرام.

زوبێر: ئەگەر ڕاستتان بوێ و بێیتەوە سەر سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤ.. ئەوی ئێمەش ئەچێتە خانەی دەستەمۆکردنی خەڵک لە پێناوی مەرامی خۆماندا.

نیگار: نا وانییە.. ئێمە کێمان چەوساندۆتەوە؟

زوبێر: هەموو ئەوانەی ئیشمان بۆ ئەکەن، بە زەبری پارە لە دەورمان کۆبوونەتەوە.. بۆ نمونە ئەگەر بە ئاوا کە برای ئامۆیە، هەر برایەتی، پێی بڵێین بچۆ لە پرسگە دانیشە وەڵامی چیمان ئەداتەوە؟

چیمەن: وەڵا هەر عاجزیش ئەبێ.

زوبێر: دەی ئەگەر ئەوی پرسگەکەش یان کارگوزارەکە پارەی باشی هەبووایە، کە پێم بوتایە ئا ئەو بەردەرگایە گسک بدە، ڕەنگە هەر بیکێشایە بە دەمیشما هههە.

سەلوا: دە ئیتر ئەوەش خوا دابەشی کردووەو ئەوەندەی لە ژیانا پێ بڕاوە.

زوبێر: نا نا ڕۆڵە ئەوە منم بە زەبری پارەکەم ئەوان کۆ ئەکەمەوەو سوود لە تواناکانیان وەرئەگرم و پارەی زیاتری پێ کەڵەکە ئەکەم.. بۆیە من هەر لە سەرەتاوە باسی سروشتی مرۆڤم کرد، ئەو کاتەی پارە نەبووەو بۆ نموونە بە ئاڵوێر خەڵک پێداویستیی خۆی دابین کردووە.. سەرمایەی مرۆڤەکان توانا بووە.. جا خۆ گەر بگەڕێینەوە بۆ پێشتریش، ئەوا هەموو بەقەدەر یەکمان هەبووە.

دەوران: باوەڕ ناکەم هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان هەموو مرۆڤەکان بەقەدەر یەکیان هەبووبێت.. ئەی خۆ سروشتی مرۆڤ هەر خۆی ململانێیە، چۆن توانیویانە بیگوزەرێنن؟

زوبێر: ئەو کاتە ململانێی لەگەڵ سروشت و گیاندارانی تردا هەبووە.. ئەی نابینی ئێستاش مرۆڤ لە هەوڵی دەست بەسەرا گرتنی سروشتدایە؟ ڕۆڵە پارەش کاتییە.. ئێستا کێ ئەتوانێ پارەی قەبەی هەبێ و لەماڵەکەیدا بێ، هەمووی بووە بە ژمارە.. هەر ژمارەش بۆ یەکتر ئەنێرین و ژمارە حوکممان ئەکا.

دەوران: ئەویش لە وڵاتی دواکەوتووا نا.. ڕاستە لە وڵاتانی پیشەسازییدا پارەی کاش بایەخی نییە، مووچەکانیشیان بە ئەلکترۆنی کراوە.. ئەوانیش هەر ژمارە ئەدەنەوە بۆ پڕ کردنەوەی پێداویستییەکانیان.

Cut

دیمەنی – ١٦١٠ – ش/ن –ماڵی دیدەوان:

(( دیدەوان و سەرخێڵ و ساماڵ و عارف هەوراز))

عارف: ئێستە من تێنەگەیشتم، بچمەوە ماڵی خۆم یان جاریٚ؟

دیدەوان: باوەڕ ناکەم دەوروخولی ماڵی تۆو هەورازیان دابیٚ، بۆ ناچنەوە؟

عارف: ئەمشەو ئەچمەوەو دەرگاوبان جوان ئەگرم و هەر شتێک ڕوویدا تەلەفونت بۆ ئەکەم بە ژمارە تازەکەت، داینەخەی ئامان!

هەوراز: کەس من ناناسیٚ، هیچ کێشەم نییە.

دیدەوان: خەمت نەبیٚ عارف.. هەوراز تۆش وریای مۆبایلت بە، کە پێویستم پێت بوو تەلەفونت بۆ ئەکەم. (( ڕۆشتنی عارف و زاهیدو خواحافیزیی)) ئیتر بۆ خۆمان بە هەوای شان قسە ئەکەین و کەس ئاگای لە گفتوگۆمان نابیٚ.

ساماڵ: بەردەوام لە خزمەتتاین گەورەم.

دیدەوان: من ئەمەویٚ بە تەواوەتیی پشت بەم دووەتان ببەستم و دڵنیابن ئەتانکەم بە گەورەترین ملیۆنێری ئەم وڵاتە.

سەرخێڵ ئەوی جەنابت فەرمانی پیٚ بکەی، ئێمە درێغی ناکەین.

دیدەوان: هەریەکەتان پێنج کەس بهێننە ژێر دەستی خۆتان و کەستان نەزانیٚ ئەویتر کێی لایە.. بە هیچ جۆرێک کەسمان نەبینن، باشە باوکە؟

ساماڵ: بەسەرچاو.

دیدەوان: خۆتان ئەزانن ئەم ئیشە بە جۆرێک مەترسیدارە، کە کەسمان بە تەمای ژیانی خۆمان نیین.. واتە لە ئان و ساتاین، بگیرێین و وەک دارەوانمان لیٚ بەسەربیٚ.

ساماڵ: بەڵیٚ زۆر ڕاستە.. بەڵام یاخوا تۆ تەمەنت هەزار ساڵ زیاتر بیٚ.

سەرخێڵ: دارەوان کێیە؟

دیدەوان: دوایی ساماڵ بۆت باس ئەکا.. لەبەرئەوە من چەند ساڵێکی زۆرە کەسێکم لەبری خۆم داناوەو لای کەسیش نەمدرکاندووە.. ئەمەش بۆیە بە ئێوە ئەڵێم چونکە من ئەم گروپەم وا دامەزراندووە، ئەبێ تا هەتایە بڕ بکا.. لە چاوتانا متمانەی تەواو ئەبینم و ئەزانم ئێوەی گەنجن و ئەتوانن بیپارێزن و نەهێڵن لەناو بچێت.

ساماڵ: گەورەم تۆ خۆت هەر گەنجیت و پێویست ناکا جارێ ئەو قسانە بۆ ئێمە بکەی.

سەرخێڵ: ئێمە خزمەتکاری تۆین و هیچیتر.

دیدەوان: نا باوکی من.. ژیان بەدەست خۆمان نییە.. وا من ئەمشەو بۆ نمونە جەڵتە لێیدام.. با کەسێک هەبێ نهێنییەکانی دامەزراندنی ئەم گروپەو چۆنێتیی بەردەوام بوونی بزانێ.

ساماڵ: ئەی چۆن بوو بە کاک ڕەوەز یان کاک عارفت نە وت؟

دیدەوان: متمانەم بە شەنیا زیاترە لەوان هەهە.. ئەیبینن ئەوانیش چ مارێک دەرئەچن.. بە هەرحاڵ، من هەرچی پارەو پول و ڕێ و شوێن و بەرنامەم هەیە، لای کەسێکە بە ناوی جەباری نمەک سوێر.

ساماڵ: جا با هەر لای ئەو بێ.

دیدەوان: لای ئەو ئەبێ تا من بمێنم.. هەرکاتێکیش شتێکم بەسەرهات، ئەوا بچن بەم ناونیشانەی پێتان ئەڵێم، هەموو شتەکانی لێوەرگرن و ئێوەش بە باوەڕ پێکراوێکی خۆتانی بسپێرن.. خۆشتان ببن بە سەرۆکی ئەم گروپە.. بەڵام وریابن بە ئەزمونەکەی من و دارەوانا تێپەڕ نەبن، ساماڵ بۆم باسکردووی.

ساماڵ: ئەی چۆن ئەتوانین بیگەینێ، مەبەستم ناونیشانەکەیەتی.

Cut

دیمەنی – ١٦١١ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( تافان ئەڕوات و خواحافیزیی لە نارەوەن و خدر، دوای ئەو ئاواو نینا دێنە ژوورەوە))

ئاوا(( بۆ خدر)): ئەرێ تۆ خۆت وتت متمانەی پێ مەکەو وا بکە دووریخەیتەوە.. ئەوەت لەچی و ئەمەت لەچی؟

خدر: ئیشم پێیەتی ئاوا گیان، ئەم چەتیوە شتی زۆر لەژێر سەرایە، ورد ورد ئەبێ بیدۆزینەوە.

ئاوا: ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە، بەڕاستی ڕەزای زۆر گرانە، تکایە داینەمەزرێننەوە لێرە، هەر ئەوەت لێ داوا ئەکەم.

نارەوەن: نا ڕۆڵە لە هیچ شوێنێک بە قسەی ئێمە دانامەزرێتەوە، بێخەمبە.

ئاوا: نینا بچین بۆ ڤیزەکان؟

نینا: ئەی مادام ئەمان هاتن، ئیتر ئێمە پشووین تا ئەڕۆین.

خدر: نا نا واش نا، جاروبار سەرێ بدەنەوە.

ئاوا: ئەوە لە مەزەبی ئێمەیا نییە، خۆتان مەسولی بەڕڕو بەحر بن.. هەرچییەکیشتان پەیا کرد تا دێینەوە، هەمووی بۆ خۆتان هههە.

نینا: ئێمە ئێستا لە قۆناغی خەرجکردناین ڕاست ئەکا.

نارەوەن: کێشە نییە، ئێمەش بۆتان کۆئەکەینەوە هاها (( پێکەنینی هەمووان))

Cut

دیمەنی – ١٦١٢ – ڕ / د – ساحەی شوقەکانیماڵی ڕێبوارو خدری کۆن:

(( ڕێبوارو دلێرو ڕەوەزو زاهید ))

زاهید: واو قازانجەکە زۆر زۆرە! ئەی چۆنە ئیشەکەش بکەین و پێی بڵێین کابرا درۆی کرد هیچی نەهێنا؟.. کابراش بۆ خۆمان ئەقۆزینەوەو قازانجەکەش بەشی چوار پێنج ئیشیتری وا ئەکا.

ڕێبوار: باشتر ئەوەیە دەستمایەو قازانج پێکەوە ببەین بۆ خۆمان.. ئەو کێی لەگەڵایە بەرگریی لێ بکا؟

دلێر: کاک ساماڵی لەگەڵە، من پێی ئەڵێم هەقی بەسەر هیچەوە نەبێ و خۆی تێوە نەگلێنێ.

ڕەوەز(( گرژ)): لێرە برادەرایەتی و شتی وا ناخوا هەتیو.. سەرچڵ کە ئەوسا لەگەڵ ئێمەیا بوو، نزیکترین هاوڕێی خۆی کوشت.. ئێرە دنیای بەرژەوەندییەکانە، تێگەیشتی؟

زاهید: ئەگەر پێویستی کرد ساماڵ ئەدەینە دەست خۆت بیکوژی.. ئەوە یاسای ئێرەیە.

دلێر: ئەمرەکەی گەورەم.

ڕەوەز: یەک وشەی لا نادرکێنی، ئەگینا پێش ئەوەی تۆ بیکەی بە ژەمە خواردنی ئێوارەت، ئەو بۆ نیوەڕۆ ئەتخاتە سەر برنج.. خۆ تێئەگەی!

دلێر: بەڵێ گەورەم، زۆر باش.

ڕەوەز(( بۆ ڕێبوار)): ئێستا زۆر بە پەلە ئەو ژنەی کە باست کردو ئەو تافانەم ئەوێ.

ڕێبوار: ئەبێ بچمەوە سەر ماڵی تافان، بەڵام سوعاد ئامادەیە کاکە ڕەوەز.

ڕەوەز: ئەی ئەو سوعادە کچێکیتر شک نابا تا ئەوەندە نەچینە خاکپای تافان؟

ڕێبوار: با بزانم.

ڕەوەز: دەک عەمرت نەمێنێ، خۆ تا ئێستا هەر چاوەڕێی تافانەو بیری لەوە نەکردۆتەوە.

زاهید: ئەی نارەوەنەکە ئەو چی؟

ڕەوەز: کە بۆ دیدەوانم باسکرد، وتی لێبیگەڕێن بۆ خۆم.. کاکە ئەو خدرە کەللەپووتە پەنجا پاسەوانی بۆ داناوە.

ڕێبوار: ئەی خەسویەتی قوربان، چۆن بۆی دانانێ؟

ڕەوەز: دەی ئێستا زۆر لەسەری مەڕۆن.. ئەگەر سبەینێ دوو ژنمان بۆ پەیا نەکرێ، ئەبێ دوو سبەی خۆمان بچین و بە پێ ئەو شاخ و کێوە بکوتین.

زاهید: ئەگەر ژنەکانیش بەردەست نەبوون.. ئەوە ئەهێنێ بۆی ماندوو بین ئاساییە.

ڕێبوار(( زەنگی مۆبایلەکەی دێت و تەماشای ئەکا)): واو بەسەرباسی خۆیا هات.. تافانە.

Cut

دیمەنی – ١٦١٣ – ڕ/ د – غازفرۆشی عارف:

(( دیدەوان و عارف و سامالّ، بە چواردەورا چاو ئەگێڕێ وەک پاسەوانی دیدەوان بێ))

سامالّ: چۆن فریا ناکەوم؟ خۆ ئەگەر هەر هیچم پێ نەکرێ خۆم ئەدەمە بەر ئەو گوللانەی بە ئاراستەی گەورەما بتەقێنرێ.

عارف: ئەک ئافەرین.. یەکێکی واش بۆ من پەیاکەن.

دیدەوان: تۆ جارێ کێشەت نییە، ئیشی خۆت بکەو با کەسیش نەزانێ لە مەترسیدای، با ببینرێی کە هەر ئیشەکەی خۆت ئەکەی، وا باشترە.

عارف: کەواتە مەیە بۆ ئێرە.

دیدەوان: من هەر بۆ ئەوە هاتم پێت بڵێم مریەم داوای کردووە سەعات دوو هەوراز لە ئۆفیس بێت و بیبینێ، خۆشم ڕەوەزم ڕاسپاردووە بۆ ئیشی تازەو کڕیاری باشیشم بۆ پەیا کردووە.. ئیتر خۆت درێژەت دایە.

عارف: مریەم بۆچی هەوراز ئەبینێ؟

دیدەوان: نازانم، هەر پەیوەندیی بە ئیشەکەوە نەبێ باشە.

عارف: بچم بۆ لای هەوراز؟ یان خۆت ئەچی؟

دیدەوان: نە تۆ بچۆو نە منیش.. دوایی هەموو شتێک خۆی دەرئەکەوێ.

عارف: ئەی کەواتە چی ئەکەی لە بازاڕا؟

دیدەوان: ئەمەوێ خۆم دەرخەم و بزانن ترسم لە هیچ کەسێک نییە.

عارف: باشە دە بڕۆن شەو ئەتانبینمەوە.

دیدەوان: نا مەیە، نەک کەسێک دوات بکەوێ.. جارێ تۆی پێویست نییە.

Cut

دیمەنی – ١٦١٤ – ڕ/ د – پارکێک:

(( تافان لە پارکێدا دانیشتووە))

**تافان مۆنۆلۆژی ناوەوەی ناوەوە:**

بۆچی باسی ئەوەیان بۆ بکەم بۆ دەرمانخوارد کردنی نینا وایانکرد بچمە کۆمپانیاکەیان؟.. نەبابە.. بەخوا بیڵێم هیچ متمانەیەکیان پێم نامێنێ.. خۆ تازە هیچیش ڕووی نەداو کەسیش ئەوەیان بۆ باس ناکا.. سەرم نایەشێ ئیتر ئەم پاراسیتۆڵە بۆ بخۆم.

**مۆنۆلۆژی ناوەوە تەواو:**

(( شەنیاو گوڵزار لە شوێنێکەوە چاودێریی تافان ئەکەن و خدر بە تەنها پەیا ئەبێت و ئەچێت لە تەنیشتیەوە دائەنیشێت، پاش سڵاوی هاکەزایی))

خدر: دەرنەکەوتوون دیارە!

تافان: وا هەر چاوەڕێم.. بەڵام وتی کە ئێوە دانیشتن، ئەوسا ئێمە دێین.

خدر: هەر ئەبێ وابێ.. چاو مەگێڕە ئێستا ئەوان لە شوێنێکەوە چاودێریی ئەکەن.

تافان: وەی قوڕ بەسەری من.. تۆ بڵێی تەقەمان لێ نەکەن؟

خدر: نا باوانم ئیشیان پێمانە، ئێستا ئەوان، لە ئێمە ئەترسن.. ئەها هەندێ کەس لە پشیلە ئەترسێ، نازانێ پشیلەکە زۆر زیاتر لەو ئەترسێ.. ئێستا ئێمە ئاواین.

تافان: یەعنی من لە پشیلە ترسام؟ هەهە.

خدر: ئافەرین ئاوا پێ بکەنە، وا دەرکەوتن.

(( شەنیا ٢و گوڵزار دێن و سڵاوی گەرم))

خدر: دانیشتنەکەمان خۆش نییە پیاوێک لەناو سێ ژنا.. با زوو کۆتایی پێ بێنین.

شەنیا ٢: قەت لەو بڕوایەدا نەبووم ئەوە بیرکردنەوەی تۆ بێ کاک حەمەخدر، پیاو چییەو ژن چییە؟ گرنگ ئەوەیە بتوانین ئیش بکەین.

خدر: تۆ ڕاست ئەکەی ببورە.. هەڵبەت ئێمە کەم تا زۆر ناوی یەکترمان بیستووە، ئەگەر یەکتریش نەناسین.. پێویستی بەو هەموو پێچە بەدەورەیە نەئەکرد بۆ ئیش کردن.. لەگەڵ دانانی کارتۆنە ئاوەکانەوە، من بڕیارمدا ئیش لەگەڵ ئێوەیا بکەم و دیدەوانم ئیزندا.. کەچی زۆر خراپ حاڵیی بوون.

شەنیا ٢: پێش ئەوەی بچینە سەر باسی ئیش، ئەوانەی لای من دوو کچیان بینی بوو، ئەم بەیانییە هێرشیان کردبووە سەرتان و دوایی هەڵاتبوون.

خدر: ئەها، کەواتە بەردەوام چاودێریش ئەکرێین هەهە.

شەنیا ٢: ئەوە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەزانم کێ ناردوونی.

خدر: ڕاستیەکەی مەبەستمە بزانم کێ ناردبوونی! سوپاست ئەکەم.

شەنیا ٢: سوپاسی ناوێ، پاراستنی تۆو نارەوەن خان ئەرکی منە.. ڕەوەز ناردبوونی کاک حەمەخدر، ئەوی لای ئاوای ژنبرات ئیشی ئەکرد.

خدر: تۆ ئەمەت چۆن زانی؟

شەنیا ٢: ئەوە ئیشی خۆمانە.. ئەو دوو کچەی هاتبوون ناویشیان پەیمان و لاوێنە.

خدر: وایە زۆر ڕاستە، یەکێکیان ناوی لاوێن بوو.

شەنیا ٢: ئیتر ئەوە خۆت ئەزانی چۆن ڕێک ئەکەوی لەگەڵیا.. ئینجا با بێینە سەر باسی یەکەم ئیشی ئێوە.

خدر: یەکێ هێرش بکاتە سەرت، ڕێک ئەکەوی لەگەڵیا؟ ئەوەیان لەودیوی مەحاڵەوەیە شەنیا گیان.. سوپاس کە پێتوتم، ئەوی هەڕەشەی کرد، مانای ئەوەیە بێدەسەڵاتە.. بەڵام خۆت ئەنجامەکەشی ئەبیسیی.

ــــــــــــــ ربط ــــــــــــــ Cut ــــــــــــــ

دیمەنی – ١٦١٥ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ چا بۆ یەک دووانێک تێ ئەکات و سەرچڵ پەیا ئەبێ.. دائەنیشێت و داوای چا ئەکا.. پاش کەمێک هاوڕێ بانگ ئەکا ))

سەرچڵ: ئەوە زەحمەت نەبێ، ئەمە ئۆفیسی نارەوەن خانە؟

هاوڕێ: بەڵێ.. ئەمرێکت هەبوو؟

سەرچڵ: لەوێیە زەحمەت نەبێ؟

هاوڕێ: بۆچیتە کاکە؟

سەرچل: ڕاستییەکەی کۆمەڵێ ئازووقەم ئەویست.

هاوڕێ: جا ئەوە نارەوەن خانی بۆچییە؟ (( ئاماژەی لای هەندرێن ئەکا ))ئەچیتە ئا ئەوێ و کاک هەندرێن هەموو شتێکت ئەداتێ.

سەرچڵ(( هەڵئەسێ و هاوڕێ کاکە کاکە دوای ئەکەوێ، کە چی لە نارەوەن ئەوێ )): بزانم خۆی لەوێیە (( دەرگا ئەکاتەوە، تریفە ئەبینێ )) ئەوە نارەوەن خانە؟

هاوڕێ(( توند باڵی ئەگرێت و ئەیهێنێتەوە شوێنی خۆی، تووڕە )): ئەرێ پێموتی تۆ ئیشت بەو نییە، بۆ هەر خۆت ئەکوتی بۆ ژوورەکەی.. نەخێر لێرە نییەو فەرموو دانیشە ئەگەر چا ئەخۆی، ئەگەر ناشخۆی عەرەبانەکەت ڕاکێشەو ون بە لەبەرچاوم.

سەرچڵ: من بۆ مامەڵەیەک هاتووم کابرا، ئیتر بۆ وا خۆت شین و مۆر ئەکەیتەوە؟

هاوڕێ: ئیشەکەت مناڵانە بوو.. پرس بکەو وەڵامت بدرێتەوە، ئیتر بۆ هێرش ئەبەیتە سەر ژوورەوە.

سەرچڵ: ئۆو تۆ خەریکە ئیشەکە گەورە ئەکەیتەوە.. وا باشترە بڕۆم، ڕەنگە کەمێکیتر پۆلیسیشم بۆ بانگکەی.

هاوڕێ: ئەی تۆ هەڵبکوتیتە سەر ئەو زەعیفەیە لە ژوورەوە چۆن بانگی ناکەم ؟

سەرچڵ: تۆ زۆر گەرمی کەڵکی قسە لەگەڵا کردنت هەر نییە.. ئەوە چاکەشتم نەخوارد.

هاوڕێ: کەیفی خۆتە بڕۆ.. منیش چا نادەم بە نەفەری وەک تۆ.

(( سەرچڵ بە تووڕەیی ئەڕوا، هاوڕێش تووڕە))

Cut

دیمەنی – ١٦١٦ – ڕ/ د – مربوط بە دیمەنی – ١٦١٤- ڕ/ د – پارکەکەی خدر دانیشتووە:

(( خدرو شەنیاو تافان و گوڵزار لە باخەکەدا دیارن.. سەیارەیەکی مەدەنیی ملازم ئاری و دووکەسیتری تیایە، ئاری لە دواوە دانیشتووەو ئەوان لە پێشەوە))

یەکێکیان (( ئاماژەی ناو باخەکە ئەکا)): ئێمە دوای ئەو دووەیانکەوین و شوێنی نیشتەجێیان بزانین؟

ئاری: دەمخۆش.. بەڵام وریابن لەدەستتان دەرنەچن و ونیان نەکەن.

ئەویتر: بێخەمبە گەورەم، لێیان نابینەوە.

ئاری: هەر لەگەڵ دەرچوون، ئێوە شوێنیان ئەکەون و تەلەفونێکم بۆ بکەن و دایمەخەنەوە تا ئەگەنە شوێنی مەبەست.

هەردووکیان: سەرچاو گەورەم.

ئاری: دەی من جێتان ئەهێڵم بتانبینم.

یەکێکیان: هیچ خەمت نەبێ گەورەم.

Cut

دیمەنی – ١٦١٧ – ڕ/ د – بەرماڵی نارەوەن:

Mute

(( سەرچڵ بەبەرماڵی نارەوەندا ئەڕواو سەرەتاتکێ ئەکا بۆ ئەوەی نارەوەن ببینێ، دواتر هەست ئەکا ماڵەکە چۆڵە ئەڕوات))

Cut

دیمەنی – ١٦١٨ – ڕ / ن – ئۆفیسی دیکۆرات:

(( جەبار نمەک سوێر کابرایەکی تەمەن ٦٠ ساڵ جلی کوردی لەبەرە، کەمێک ورگن، سەرو سمێڵی بۆیاخ دانیشتووە.. دیدەوان لەسەر قەنەفەیەک، ساماڵ لە دەرەوە وەستاوە ))

جەبار: پێتوتوون ئەو پارەیە چەندە لای منە؟

دیدەوان: نا جارێ ئەوەم پێ نەوتوون.. پێویست ناکا خۆ من لە سەرەمەرگا نییم. هاهاها.. بەڵام خوانەخواست هەر شتێک ڕوویدا ئیتر ئەو دووە ئەبن بە خاوەنی و پێشموتوون لە هەموو ئیشێکتانا بەشی تۆ هەر بە ٥% ی خۆمان دابنێن.. لەبەرئەوەی زۆر ئەمینە.

جەبار: تۆ پیاوێکی بەڕێزی کاک دیدەوان، من کێشەی پارەم نەبووە لەگەڵ تۆدا.. ئیشەڵا هیچیش ڕوونەداو تۆ هەر ئەمێنی.. بەڵام ئەی خۆ منیش تەمەنی نوحم نابێ.

دیدەوان: حسابی ئەوەشم کردووە، ئەوانیش لای کەسێک دایبنێن کە هاوتەمەنی خۆیان بێ.. بەڵام ئەو ٥% ە لەبەر من تا بمێنی ئەدرێتە تۆ.

جەبار: من شوێنی پارەو بەرنامەی گروپەکەم پێوتووی لە کوێیە.. کێ ناڵێ پێش تۆ من ناڕۆم.. ئەوەشت پێوتوون.

دیدەوان: بەڵێ.. هەموو شتێکم لەگەڵا باسکردوون.. ئەوان هی ئەوە نیین بێن بۆی، جارێ وا خۆم ڕایئەکێشم و ئەوانیش لە سەروو دڵنیاییەوەن.

جەبار: خوا تۆی خۆش ئەوێ کاک دیدەوان، بەردەوام خەڵکی باش ئەبێ بە تووشتەوە.

دیدەوان: هی ئەوەیە خۆمان باشین هاهاها.. با تۆش هەر بیناسی (( لە جامخانەکەوە نیشانی ئەدا )) ئا ئەو گەنجەی دەرەوەیە، ئەوە یەکێکیانە.

Cut

دیمەنی – ١٦١٩ – مربوط لەگەڵ دیمەنی – ١٦١٤ – ڕ / د – دەرەوەی پارکەکەی کە خدرو شەنیاو گوڵزارو تافان دانیشتوون:

(( لاوێن و ئارینا، لە پەنایەکی باخەکەوە چاودێریی ئەکەن))

ئارینا: خۆزگە ئەقڵی گەورە بەرنامەکەی وا دابنایا خۆم یەکەم فیشەک بتەقێنم و بینێم بەو سەرە لووسەیەوە.

لاوێن: پێموت، ڕازیی نەبوو، وتی جارێ ئیشم پێیەتی.

ئارینا: دەسکەوتی کوشتنەکەی نارەوەنیشی دا بە سەرچڵ، وتی من خدر ئەهێنمە ئێرەو تۆ بچۆ نەجاتیبە.

لاوێن: ئەگەر بە قسەم بکەی پێش کاک سەرچڵ خۆمان ئەیکوژین، شتێکی زۆر باش بە خەیاڵما هاتووە ــــــ

# (( ئەڵقەی حەفتاو حەوت))

ــــــ.. ئەمجارە ئەو دەسکەوتەش هەر بۆ خۆمان ئەبێ.. بەڵام جارێ نا، دوایی بۆت باس ئەکەم، جارێ با ئەقڵی گەورە بپارێزین و سەرنجمان نەڕوا.

ئارینا: چاوم نەتروکاندووە، یەک جوڵەی بە جۆرێ بکا، مێشکی هەڵئەگرم.. خۆت وتت نیشانە پێکانت نایابە.

لاوێن: هەر زۆر نایابە دەستخۆش، ئەڵێی پێشتر تەقەت کردووە؟! هههە.

Cut

دیمەنی – ١٦٢٠ – ڕ/ د – بەر عیمارەی شوقە کۆنەکەی خدر:

Mute

(( سەیارەکەی حمەخدرو سەیارەیەکیتر وەستاوە گەنجێکی تیایە، کە چاوەڕێی خدر٢ ە، کەسێک دێت و دەرگای سەیارەی خدر ئەکاتەوە دانەخراوەو سلف لێئەدات و ئەیبات))

Cut

دیمەنی – ١٦٢١ –ڕ/ن –ئۆفیسی وەکالەت:

(( تریفە بە تەنها دانیشتووە، قەلەقە، پاش کەمێک ئامۆ دێت بۆ لای و سڵاوی ئاسایی))

ئامۆ: دیارە دایکم لەوبەرە.

تریفە: بەڵی لەگەڵ حەمەخدرا چوونەتە جێگەکەی ئاواو نینا.

ئامۆ: هەموو شتێ باشە تریفە گیان.

تریفە(( کەمێک بێدەنگیی)): ئامۆ گیان پێ ئەچێ هەموو شتێ باش نەبێ.. ئەم قسەیەم بۆ درکاندن نییە لای دایکم و حەمەخدر، بیپارێزە. تریفە.

ئامۆ: بە دڵنیایی.

تریفە: جووڵەیەکی نائاسایی هەیە منالیش درکی پێ ئەکا.. بەڵام گرفتم ئەوەیە نازانم چ شوێنێکی جووڵەکەو چ شتێک باش نییە.. من وەک کوڕی گەورەی ماڵەکە پێمووتی.

ئامۆ: مادام نەزانی چ شتێک باش نییە، ناتوانی بە منیشی بڵێی.. بەڵام گەر باسی جووڵە نائاساییەکەم بۆ بکەیت، ڕەنگە شتێک تێبگەم.. خەمت نەبێ، وا خۆم دەرناخەم شتێک بزانم.

تریفە: نازانم، هەست ئەکەم کۆمەڵێک پاسەوان بۆ دایکم دانراوە.. چ کە لێرە بوو، چ لە کۆمپانیاکەی ئاوا.. ئێستا کابرایەک لەپڕا دەرگای لەسەر کردمەوە، هاوڕێی چایچی ئەوەندەی نەمابوو بەر شەقی بدات.. لە هەمووی گرنگتر کە نابێ تۆ هەر بیزانیت ئەوەیە ئەم بەیانییە دوو کچی گەنج ویستوویانە بە چەقۆ دایکم بکوژن.

ئامۆ: جا دایکم چی لە چیایە تا هەوڵی کوشتنی بدرێت؟ سەیرە! یان ئەوەیە ئێمە ئاگامان لێی بڕاوەو تەواو فەرامۆشمان کردووە.

تریفە: ئەزانم حەمەخدر زۆر باش چاودێریی ئەکات و هەر ئەویش پاسەوانی بۆ داناوە.. بەڵام ئەگەر خۆی لێرە نەبووایە ئێستا دایکم کوژرابوو.. کێ نالێ ئەگەر هاورێ لێرە نەبووایە منیش نەئەکوژرام؟

ئامۆ: هەست بە هیچ ئەکەی شایانی ئەوە بێ بگاتە ڕاددەی کوشتن؟

تریفە: ئاخر دەی کێشەکەم ئەوەیە کە هیچ شتێک شک نابەم.. بۆیە بە تۆشم وت، تا کەمێک گرنگی بە دایکم بدەیت.

ئامۆ: کاک زوبێر پیاوێکی ڕۆشنبیرە.. ئەچمە لای ئەو و تێی ئەگەیەنم.. چونکە بە ڕاستیی خۆم نازانم لەکوێوە تێهەڵچم و چۆن بگەمە سەرەداوێک.

تریفە: بەڵام نیگار خانیش بەردەوام لە لایەوە کەوتووەو بگاتە دەمی ئەو ڕەنگە لە خوتوخۆڕایی چیرۆکێک بۆ دایکم دروست بکەین.

ئامۆ: نا گوڵم مەترسە.. چارەسەری ئەوە ئەکەم.. ئێستا دایکم و کاک حمەخدر لەوبەرەوەن؟

تریفە: بەڵێ.. تەنانەت ئەوەشیان لە من قەدەغە کردووە بچم سەرێکی بدەم، یان تا لای هەندرینیش بچم.

ئامۆ: ئۆووو کەواتە خۆپارێزییەکە پلە جیمە هەهە مەترسییدارە.

تریفە: واپێ ئەچێ.

ئامۆ: دەی تۆ ئاگاداری خۆت بە باوانم.. با بچم سەرێکی ئەویش بدەم، بزانم هیچی لێ هەڵناکرێنم.

تریفە: ئامان نەزانێ من هیچم درکاندبێ.

ئامۆ: ئۆکەی! جارێ بای.

(( ڕۆشتنی ئامۆو قەلەقی تریفە))

Cut

دیمەنی – ١٦٢٢ – ڕ/د – لای پارکەکەی خدر – ناو سەیارەی دوو پۆلیسەکە:

(( دوو پۆلیسەکە شەنیاو خدرو گوڵزارو تافان ئەبینن هەڵئەسن و دوو دوو بۆ دەرەوەی باخەکە ئەچن))

یەکیان: ئا قوربانت بیخەرە ئیش وا هەستان.

شۆفێرەکە(( سلف لێ ئەدات)): با بوەستین بزانین بەرەو کام لاوە ئەچن.

ئەویتر: هەر ئەبێ بەو سایدەی بەردەممانا بڕۆن، ناتوانن ڕۆنگ ساید بڕۆن.

شۆفێر: با لە پێشمانەوە بڕۆن ئەیانبینین.

ئەویتر: زۆر چاکە.

Cut

دیمەنی – ١٦٢٣ – ڕ/ د – بەردەمی چاپخانەی تیرۆژ:

(( تیرۆژو دەوران ئەیانەوێ بچنە سەیارەکەی هەستییەوە.. باهۆزی شاعیر دەرئەکەوێ))

باهۆز(( دەنگی بەرز بۆ تیرۆژ)): دادەخان.. دادەخان! خانم.

تیرۆژ(( ئاوڕ ئەداتەوە)): ئۆو ببورە کاک باهۆز (( سڵاو و وەڵام)) فەرموو!

باهۆز: هاتم پێت بڵێم بە نرخەکەتان ڕازیم، ئەگەر کەمێ دەستوبردم بۆ بکەن و زوو چاپیکەن.. تەنها دیزاینی بەرگەکە ببینم و هیچیتر.

تیرۆژ: دیزاین (( دەست بۆ هەستیی درێژ ئەکا)) ئەو دیزاینەرە گەورەیە بۆی کردووی خەمت نەبێ، زۆر تایبەت و نایابە.

باهۆز: ئەی ناکرێ بیبینم، هەرچەند دواش ئەکەون.

تیرۆژ: نا تکایە کاتێکیتر، زۆرم برسییەو دەعوەتی ئەوانیشم، سوپاست ئەکەم ئەگەر دوای دوو سەعاتی تر بێیتەوە لێرە ئەبم.

باهۆز: باشە کێشە نییە قوربان، دوو سەعاتیتریش بۆ تۆ.

(( تیرۆژ سوپاسی ئەکەن و لەگەڵ دەوران ئەچنە سەیارەکەی هەستییەوە))

Cut

دیمەنی – ١٦٢٤ – ڕ/ د – شوقە کۆنەکەی خدر:

Mute

(( خدر سەکسوک و قژە باڕوکەکەی و قات و بۆینباخێک ئەدۆزێتەوە لە کەنتۆرە کۆنەکەی خۆیا، واتە پێداویستییەکانی خدر٢ ئەپۆشێت و ئەچێتە دەرەوە، پێش چوونە دەرەوەی لە کونی درگاوە دڵنیا ئەبێتەوە کەس دیار نییە))

______ تابع ________ Cut ____________

دیمەنی – ١٦٢٥ – متبوع – ڕ/ د – بەردەمی شوقەی خدر:

(( خدر٢ دێتە خوارەوەو سەیارەیەک چاوەڕوانی ئەکات.. سەیارەکەی خۆی لەوێ نییە.. کوڕێکی گەنج لە لایەکی سەیارەکەوە وەستاوەو کە خدر دەرئەکەوێت ئامادە ئەبێ))

گەنج: فەرموو گەورەم.

خدر: ئامادەی؟

گەنج: بەڵێ.

خدر: با بڕۆین.

(( ئەچنە سەیارەکەوەو ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٦٢٦ – ڕ/ن – ژووری بەهێز:

(( بەهێزو ئاری))

ئاری: گەورەم ورد چاودێرییان کردن، بەڵام دوای ڕێگۆڕکێیەکی زۆر، خۆیان ونکرد.

بەهێز: کەواتە هەستیان بە دواکەوتن کردووە.

ئارێ: بەڵێ گەورەم قسەکەی جەنابت دەرچوو.. ئەمان دوای سەیارەی یەکەم کەوتبوون، سەیارەی دووەم پشتی لێ گرتبوون، وابوو، پاسەوانیشیان هەبوو.

بەهێز: کەواتە باش بووە تەقەشیان لێ نەکردوون.

ئاری: بەڵێ گەورەم، دواکەوتنەکەیان زۆر بووەو گەر بەردەوام بوونایە سەیارەی دووەم کارەساتێکی ئەخوڵقاند، بە ناچاریی پاشەکشەم پێکردن.

بەهێز: دەستخۆش، ئیشێکی ئاقڵانەت کرد.. کێشە نییە دەرفەتی باشتریش دێتە بەردەممان.

Cut

دیمەنی – ١٦٢٧ – ڕ/ د – ناو سەیارەکەی حمە خدر تیایە:

((خدرو گەنجەکە کامێرایەکی بە زوومەوە پێیە))

خدر: سەعات دووی ڕێکە.. هەر ژنێک هات بۆ ئۆفیسەکە........ (( تەماشای مریەم ئەکا لە سەیارەیەک دائەبەزێ)) ئەها ئەوەی پێشمانەوە، ڕەنگە ئەوە بێت، خێرا وێنەی بگرە، ئەها بەرەو ئۆفیسەکەش ئەچێ.. هەوە هەوە.. تەواوە.. ئیتر من جێت ئەهێڵم و تۆ خۆت دوایکەوە تا ماڵی ئەدۆزیتەوە.. وەک وتم بە هێمنیی.

گەنج: سەیارەکەی ئیزندا.

خدر: دیارە بە تەکسی ئەگەڕێتەوە، ونی نەکەی باوانم.

گەنج: نا گەورەم، لە خزمەتدام.

خدر: دەی من ئەڕۆم با سەرنج نەیەتە سەر سەیارەکە.

گەنج: خوات لەگەڵ.

(( خدر بە بێ ئەوەی سەرنجی ئۆفیسەکە بدات دائەبەزێت و لە دووری سەیارەکە تەکسی ئەگرێت))

Cut

دیمەنی – ١٦٢٨ – ڕ/ د – ناو سەیارەی شەنیاو گوڵزار:

(( سەرچڵ لە جامی سایەقەوە قسە لەگەڵ شەنیا ئەکا.. لاوێن و ئاریناش لە سەیارەیەکیترەوە هاتوون و لە پشتی سەرچڵەوە وەستاون))

شەنیا: نا بەساقەوبم سەلامەت دەرچووین، خەریک بوو بە لاوێن بڵێم تەقەیان لێ بکا، دوو دەقەیتر بەردەوام بوونایە لە شوێنکەوتنمان، کوژرابوون.

خدر: خدر شوێنی خستوون.

شەنیا: لەو زیاتر کێ ئەیزانی پێکەوە دائەنیشین.. دیارە بە نیازی ئەوە بووە شوێنمان بدۆزێتەوە.

گوڵزار: خۆزگە تەرمەکانی بچوایەتەوە بەردەست.. تا جارێکیتر فێری چاودێریی کردن نەبووایە.

شەنیا: ئەمجارە نا، جارێکیتر.. ئەی تۆ چیت کرد؟

سەرچڵ: نارەوەن شوێنی خۆی گۆڕیوە، چوومە بەرماڵیشیان، کەس لەماڵەوە نەبوو.

لاوێن: چۆن؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟ ئەی لە کوێیە؟

سەرچڵ: پەلەمان نییە، هەر ئەیدۆزمەوە.

شەنیا: بیدۆزەرەوەو با ئەمجارە بەرنامەیەکی تۆکمەی بۆ دابنێین.

Cut

دیمەنی – ١٦٢٩ – ڕ/ د – بەر عیمارەی شوقەی حمەخدر٢:

Mute

(( خدر٢ بە تەکسییەک ئەگەڕێتەوە بۆ شوقە کۆنەکەی خۆی.. سەیارەکەی لەبەردەرگا بۆ دانراوەتەوە))

Cut

دیمەنی – ١٦٣٠ – ڕ/ن – ئۆفیسی هەوراز:

(( مریەم و هەوراز))

هەوراز: ئەمجارە ناتوانم، بەڵام بەڵێنی جاری داهاتووت ئەدەمێ.

مریەم: جا من ویستم ئەمجارە گورزە گەورەکەیان لێ بوەشێم، جاری داهاتوو بۆچیمە؟

هەوراز: بەخوا مریەم خان زۆر لێیان ئەترسم، هیچ لارییان لە کوشتنم نییە.

مریەم(( هەڵئەسێ)): ئاخر چواری وەک تۆ کردوونی بە کەڵەگا هەی ترسنۆک!

هەوراز: داوای لێبوردنت لێ ئەکەم.

مریەم: ئەزانی ئەم قسانەیان بۆ بگێڕیتەوە، منیش لاریم نییە؟

هەوراز: نا دڵنیابە.

(( مریەم ئەچێتە دەرەوە))

تابع —— Cut

دیمەنی – ١٦٣١ – متبوع – بەردەمی ئۆفیسی هەوراز:

Mute

(( مریەم دێتە دەرەوەو سەیارەکەی خۆی دێت و لە بەردەمیا ئەوەستێ، سەیارەی گەنجەکەش بە هێمنیی دوایان ئەکەوێت))

Cut

دیمەنی – ١٦٣٢ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئامۆ هەمان ڕاکواری دیمەنی – ١٦٢١ – و نارەوەن))

نارەوەن: نا بەساقەی سەرت بم هەر خۆشیت.. ئیتر وا جارێ لێرەم تا لەسەر خێر ئاواو نینا ئەچن و دێنەوە.. (( خدر دێتە ژوورەوە)) ئەوە ئەویش هاتەوە.

(( دوای سڵاو و بەخێرهاتنەوە))

ئامۆ: ئەرێ ئەو دووە چین لەبەردەرگا کاک حەمەخدر؟ خەریک بوو نەمناسن.

خدر: دەی ئێرە پارەی تیایەو تەنیا ژنێکیش چی دەسەڵاتە ئەگەر من لێرە نەبم؟ باشتر نییە دایکت بپارێزن؟

ئامۆ: با ئەوە شتێکی باشە.. بەڵام پرسیارو خۆ گیف کردنەوەکەیان نائاسایی بوو، خۆ من لە دز ناچم هههه!

خدر: ڕەنگە ئەوان تۆزێک قورستتر ئامۆژگارییەکانیان وەرگرتبێ، ئەگینا مەبەستەکە خۆپاراستنەو هیچیتر.

ئامۆ: بەهەرحاڵ بەو هیوایەی هیچ کێشەو ترسێک نەبێ، من بە یارمەتیتان.

(( ڕۆشتن و خواحافیزیی ئامۆ))

نارەوەن: پێموتی بەو جۆرە هەموو کەسێک تێئەگا، بڕوات پێ نەکردم.

خدر: ئەی خۆ ناتخەمە بەردەستتیان وەک مەڕ کەوڵتکەن؟!

نارەوەن: ئەی گەیشتییە چی لەگەڵیانا؟

خدر: داوایان کرد من بچم پاسەوانیی تافان و کچێکیتر بکەم، کە لەسەر سنورەوە پۆدرەکە ئەهێنن.. دواتر بە بیانووی تازە ژنهێنانمەوە خۆم لێ دزینەوەو سەرەنجام ئەو چەتیوەی لەگەڵیا بوو، داوایکرد خۆی و سەرچڵ ناوێک پاسەوانییەکەیان بکەن.. دەرسی تافانم داداوە چی بکاو چی نەکا.. هەموو شتێک کۆنترۆڵە.

نارەوەن: بەڵام حسابی ئەوەش بکە هەزار ڕێگەیان داناوە بۆ خۆ پاراستن.

خدر: ئەوەندەی ئەقڵم پێی بشکێ، هەموو شتێکم لێکداوەتەوە.. بەڵام بە ڕاستیی ئەو چەتیوە جانانەو فێڵبازە.

نارەوەن: شەنیا ئەڵێی؟

خدر: بەڵێ.. باوەڕ ئەکەی هەر ئەو کاتە خەریک بوو بەزمێکم بەسەرا تێپەڕێنێ؟

نارەوەن: بەزمی چی؟

خدر: لەسەر هەوڵەکەی ئەم بەیانییە.. هەر کە باسی کرد، دڵنیا بوومەوە دەستی خۆیەتی. ئەو بە بارێکی تریا برد. بەڵام لێی تێگەیشتم بە نیازی چییە؟

نارەوەن: ئا ئا ئەوە هەوڵێکیتریش دراوە، ئەگەر من لەوێ بوومایە پیس ئەقەوما.

خدر: چۆن؟

نارەوەن: ئەی بیرم نەبوو زوو پێت بڵێم، ئەم بەیانییە کابرایەکیتریش لە پڕا دەرگای لەسەر تریفە کردۆتەوە.

(( خدر بە پەلە هەڵئەسێ و بەرەو دەرەوە ئەڕوات، نارەوەن خەندە))

Cut

دیمەنی – ١٦٣٣ – ڕ – عەسر / ن – قاوەخانە:

(( ڕێبوارو تافان))

ڕێبوار: نایکەم چییە؟ تۆ لەبەرئەوەی بە نهێنی ئێمە ئەزانی، ناکرێ پاشە کشە بکەی چاوەکەم.. دڵنیابە زەرەرت لێ ئەدەن.. بەڵام گەر ئیش بکەیتەوە، پارێزراو و زۆر دەوڵەمەندیش ئەبی.

تافان: باشە، مەرجم هەیە.

ڕێبوار: فەرموو، هەرچییەک بە ئێمە بکرێ بەسەرچاو.

تافان: لە هەر سێ کاروانا، جارێک، چارەکی دەستکەوتەکەی بۆ من بێ.

ڕێبوار: ئەوەی پێ بڵێم هەر گڕ ئەگرێ، چۆن شتی وا ئەبێ؟

تافان: ئەو مەرجەم قبوڵ نەکرێ منیش نایکەم، بڕۆ بە ڕەوەز گیان بڵێ، با ئەو وەڵام بداتەوە.. گڕ ئەگرێ یا ناگرێ جار بە جەهەنەم، چی لەدەست دێت با بیکا.

ڕێبوار: تۆم خۆشئەوێ تافان گیان، حەز ناکەم بە بەرچاومەوە بکوژرێی.

تافان: هیچم لە دنیا هەڵنەکڕاندووە تا گرفتی لە دنیا دەرچوونم هەبێ.. حەز ئەکەی خۆت بمکوژە.

ڕێبوار: تۆ زۆر ڕەشبینیت حەز ناکەم وابیت!

تافان(( بزە)): کورە ڕەشبینی چی؟ ئێوە واتان لێکردووم هەر هیچ نابینم، هیچ هیچ.

ڕێبوار(( بیرکردنەوەیەک)): بەڵام با سێیەمجار ئەو بەشەی تۆی تیابێ.

تافان: کێشەم نییە.. با سێیەمجار بێ.

ڕێبوار: هەوڵ ئەدەم ڕازیی بکەم، ئەگەر هەر ڕازیش نەبێ، خۆم چارەسەرێکی وای ئەکەم، ئەوەت دەستبکەوێ.

تافان: چۆن؟

ڕێبوار: ئەچمە لای دیدەوان و هەموو شتێکی تێئەگەیەنم.. ئەوسا هەم من و هەم تۆش نانمان ئەکەوێتە ڕۆنەوەو ڕەوەزیش ئەکرێ بە قوربانی یەک گوللەی دەمانچە.

تافان: تۆ دڵنیای من ئەو پارەیەم دەست ئەکەوێ؟

ڕێبوار: وا بزانە وەرتگرتووە.

تافان: کەواتە من بۆ یەکەم کاروان ئامادەم، چەند کیلۆیە؟

Cut

دیمەنی – ١٦٣٤ – ش/ن – ماڵی نارەوەن:

(( خدرو نارەوەن و تریفەو ئامۆ))

ئامۆ: نا نەخۆشخانەکە منی ناوێ، ئیش ئەڕوا.

نارەوەن: ڕۆڵە ئەوە باش نییە بەردەوام کۆبینەوەو چاوەڕێی پێشهات و کارەسات بکەین.

تریفە: بەڕاستی گوناهی تۆو حمەخدرە، یەکجار بە پۆلیس بڵێین و شوێنیان ئەدۆزێتەوەو لەم دڵەڕاوکێیە ڕزگارمان ئەبێ.

خدر: بە پۆلیس بوترێ زۆر خراپتر ڕوو ئەدا.

ئامۆ: واز لە پۆلیس و هەموو ئەو شتانە بێنن.. ئەزانن زۆر سەرێشە بوو کە زانیمان باوکمان لەسەرچی لە سێدارە درا؟ بەڵام ئەوی ئێوە کەس نازانێ بۆچی وا بە قەسدی سەر دواتان کەوتوون و هەوڵی کوشتنتان ئەدەن.

نارەوەن: لەوە ئەچێ کەسێک بێ کاتی خۆی باوکتان کەتنێکی پێدابێ، ئێوە خۆتان نازانن چۆن بوو، لەوەولاتر چێ!

ئامۆ: دەی ترێ ڕاست ئەکا، پۆلیس تێگەیەنن.

خدر: کاکە ئامۆ گیان، تێگەیاندنی پۆلیس، هەر هەموو ئەخاتە بەر مەترسیی، ئەوەی تا ئێستا دیارە ئەوان هەر بەشوێن دایکتەوەن، ئەویش بۆ من لێگەڕێن دڵنیابە ناهێڵم خوێن لە لوتی بێت، بەڵام کە پۆلیس تێگەیەنرا، ڕاستە دایکت باشتر ئەپارێزرێ، بەڵام ئەو کاتە بە تیرۆژیشەوە هەر هەموو ئەبین بە ئامانجی بکوژەکان.

تریفە: جا ئەکرێ هەروا لە ترسا بژیین؟

خدر: من وتم مەترسن، دایە نارەگیان خۆم ئەیپارێزم و لە خۆشم ڕانەبینم، قسەی وا ناکەم.

نارەوەن: قوربانی سەرت بم ڕۆڵە، دڵنیایانکەرەوە توخوا. ـــــ Cut ــــــ

دیمەنی – ١٦٣٥ – ش/ن – ژوورەکەی دڵنیا:

(( ئارەزوو بەدیار وێنەیەکی دڵنیاوە ئەگری))

ئارەزوو: دڵە گیان، خۆم پێموتی سەروسەکوتی ئەو هاوڕێیەتم بەدڵ نییە.. بەخوا هەر بە چاوە نەعلەتییەکانیا زانیم شتی زۆر لەژێر سەرایە.. توخوا بۆ بەقسەت نەکردم دڵە دڵ و ڕوحەکەم. (( گریان))

ئارەزوو مۆنۆلۆژی ناوەوە:

ئای خوایە سەبوورم بەیت، خەریکە شێت ئەبم.. وا دوو مانگەو من بە تەنیا ئەخەوم.. دڵەت بردەوە بۆ کوێ؟ ئاخر توخوا زۆرم پێویست پێی بوو خوایە گیان.. منت بکوشتایەو ئەم هەموو ئازارەت نەکردایە بە توشمەوە.. خوایە گیان ئارامییم بدەرێ، خوایە گیان تینی دانبەخۆدا گرتنم بدەرێ توووووخوا (( گریانی بە کوڵ))

مۆنۆلۆژ تەواو:

———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٦٣٦ – ش / ن – ماڵی تازەی دیدەوان:

(( دیدەوان و ساماڵ دەست بە قاچ و قولی خۆیا ئەهێنێ وەک نیشانەی ماندوێتیی))

دیدەوان: ئەی چۆن ڕۆڵە! لە لادێکەش هەر نەئەوەستام، من فێر نییم دانیشم.. بەردەوام هەر بە پێ هاتوچۆم کردووە.. ئەوە عەیب ناکەی کورە قاچ و قولت ئەشێلی؟ جا ئێمە کوا زۆر گەڕاوین تا وا بکەی؟

ساماڵ: بەخوا ئەوەی بە تۆ ئەکرێ گەورەم بە من ناکرێ.. هەر مردم مرد.

دیدەوان(( پێکەنین)): هەی داوەشێی هەی!! جا خۆ من دڵی دنیام بە تۆ خۆشە فریامکەوی لە تەنگانەیا، هەهە ئاوا فریام ئەکەوی؟

ساماڵ: جا خۆ فریاکەوتن لە بەپێ ڕۆشتنا نییە گەورەم؟ لە تەقەکردن و هاتنە دەستتایە، هیچ خەمی ئەوەیانت نەبێ.

دیدەوان: ڕەنگە لەم ڕۆژانەیا توشی تەقەو بەزمێ ببین.. دڵم وا ئەڵێ.

ساماڵ: من لە خزمەتتام گەورەم، لەگەڵ کێیا؟

دیدەوان: جارێ نازانم، بەڵام توش ئەبین.. ئەوە دادە مریەمیشمان خۆی خستە بەرەی دوژمنانەوە.. داوای لە هەوراز کردووە، کە بیکا بە شەریکی خۆی و پارە نەدا بە ئێمە.

ساماڵ: وا ڕێککەوتوون؟

دیدەوان: نا، هەوراز ڕازیی نەبووە.

ساماڵ: کەواتە شەڕەکەمان لەگەڵ ئەوە.

دیدەوان: دیارنییە.

Cut

دیمەنی – ١٦٣٧ – ش/ ن – ژوورەکەی شەنیا:

(( شەنیاو سەرچڵ و گوڵزارو لاوێن و ئارینا ))

شەنیا: دووایی پێتان ئەڵێم بۆ دروست لەم کاتەیا ئەوەم بۆ بکەن.

سەرچڵ: من ئەزانم بە نیازی شتی گەورەیت و ئیشەکان مسۆگەر ئەکەی.. بەڵام دوو سەفەر لە دوو ڕۆژدا، ماندوێتییە.

شەنیا: بەڵام ناچارییە.

گوڵزار: ئێمە ماندوو نابین کاک سەرچڵ خەمی ئەوەت نەبێ، بەڵام دڵنیابە تەواوی ئیشەکان چارەسەر ئەکا.

سەرچڵ: کەواتە تۆش شتێک لەوبارەیەوە ئەزانی؟

گوڵزار: نە بە چاوی تۆ بە هیچ جۆرێک، بەڵام هەر لەگەڵ کاتێکی تەرخان کرد بۆ بیرکردنەوەو پلانێکی دارِشت، دڵنیام زۆر وردو چارەسەرکەرە.

لاوێن: ئەگەر شوێنی ئەو پیرێژنەشتان دۆزییەوە، من پلانێکی باشم هەیە بۆ کۆتایی پێهێنانی.

شەنیا: ئادەی بۆم باسکە.

Cut

دیمەنی – ١٦٣٨ – ش/ن – نادی:

(( ڕەوەزو زاهید ئەخۆنەوە))

ڕەوەز: دیدەوانیش خۆیدابەدەستەوە، لەوانەیە وابزانێ هەرچی هەیەو نییە خڕ بیخەینە دەستییەوە هاهاها.

زاهید: ئاخر وا داماو نەبووایە، هەرچی هەڵئەسا سواری سەری نەئەبوو.

ڕەوەز: بەڵام بیرت نەچێ زاهید، ئەو هەتیوەی لەگەڵیایە زۆر ساختەچی و وریایە، فریای ئەکەوێ.

زاهید: ئا ئا ئا ئا باش ئەزانم، ئەو کڵاوی کردە سەری شەنیاو خۆی لێکرد بە برای ڕاماڵ، هەموو شتێکی پێ ئەکرێ، ئەزانم.

ڕەوەز: بووە بە کۆیلەی، کەس ناتوانێ لێی جیا بکاتەوە.

زاهید: ئەی چۆن متمانە بەم دوو هەتیوەی لای خۆمان ئەکەی، کە ئەو ناردوونی؟

ڕەوەز: متمانەی چی ئەوە بەڕاستتە؟ من دامناون سەریان بقەبڵێنم و هیچیتر، بۆیان نییە لەو ئیشە زیاتر کە پێیان ئەسپێرم، هیچی تر بزانن. (( زەنگی تەلەفونی ڕەوەزو تەماشای ئەکا)) ئەو ڕێبوارە کەرەیە، ها تۆ وەڵامی بدەرەوە، بڵێ خەڵکی لایە، هەرچیت هەیە بیخەرە بەیانی.

Cut

دیمەنی – ١٦٣٩ – ڕ/ د – چایخانەکە:

(( خدر دانیشتووەو سەفین و عەبەو هاوڕێ و کارەو دڵە لەو دەوروبەرەن))

خدر(( بۆ دڵەو کارە)): چاکەتان بخۆنەوەو بچنەوە شوێنی خۆتان.

دڵەو کارە: بەسەرچاو.

خدر(( زەنگی مۆبایلی دێت، وەڵام ئەداتەوە)): ئەلوو!............. ئۆو گیان دەستخۆش، هەر دوو کەس؟....... زۆر باشە، زیاتر دڵنیابەرەوەو ئەوسا چۆڵیکە........... ئەها هەرسیکیان پێکەوە هاتنە دەرەوەو دەرگایان داخست؟......... خۆ دڵنیای مریەم خۆی بوو؟.............. دەی زۆر باشە دەست خۆش.. تۆ ئەتوانی بڕۆی...... بای.

خدر(( هەڵئەسێ)): هاوڕێ گیان چاو خافڵ نەکەن باوە.

هاوڕێ: خەمت نەبێ قوربان.

Cut

دیمەنی – ١٦٤٠ – ڕ – عەسر/ د – نزیک گوندی باوانی خدر:

(( سەرچڵ شۆفێرەو گوڵزارو لاوێن لەگەڵیان.. جلی کوردییان لەبەرە، جلی کچەکان شەرواڵ و جلی ژنانە تێکەڵ و چڵکن))

سەرچڵ: ئا ماڵەکەیان ئەزانم.

گوڵزار: ئێوە هیچتان حەقتان نەبێ.. ئەوە لێگەڕێن بۆ خۆم، تەنها تەماشاچی بن و هیچیتر.. ئەوسا بمبینن.

لاوێن: من وەک خۆم ئەڵێم تا مامۆستا وەستا بێ، حەددم نییە توخنیکەوم.

گوڵزار: بزانم خدر بوو بەو پیاوەی سەیارەمان شوێن بخاو جێگەوڕێگەمان بدۆزێتەوە؟ هەی نەخۆرانی بێ.

(( نزیک ئەبنەوە لە گوند ))

Cut

دیمەنی – ١٦٤١ – ڕ/ن – ماڵی زوبێر:

(( زوبێر لەسەر عەرەبانەو نیگار وەک خۆی دانیشتوون سەلوا چەرەسیان بۆ ئەهێنێت و پاش کەمێک ئامۆ دێت، دوای سڵاو))

زوبێر: ئەوە چییە برا بەقەدەر خۆر لێمان دوورکەوتوویتەوە؟! هههە.

ئامۆ: ئەستێرەی سیوەیل یا خۆر؟

زوبێر(( ئاماژە بەسەر ئەکاو ڕیش ئەخاتە سەری لەدوورەوە)): کورە برا ئا ئەوە ئەستێرەی سیوەیلە، بەڵام خۆر ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر واتە ٩٣ ملیۆن میل دوورە لە زەوییەوە.

ئامۆ: گرنگ ئەوەیە تیشکەکەی زوو ئەگاتە ئێمە.

زوبێر: ئەی وایە تیشک فۆتۆنە، خۆ ئەلکترۆن نییە یەکە یەکە بێ، ئەو هەر خۆیەتی.. با بزانی خێرایی فۆتۆن لە چرکەیەکدا ٣٠٠ هەزار کیلۆمەترە.

ئامۆ: واو.. ئەی خۆر قەبارەی چەندە کاک زوبێر؟

قەبارەی یەک ملیۆن و سێ سەد هەزارجار ئەوەندەی زەوییەو بارستاییەکەشی ٣٣٣ هەزار جار ئەوەندەی بارستایی زەوییە.. ئەوە هەر بۆ زانیاریی خۆت بزانە.

ئامۆ: وانەیەکی فیزیایی گرنگ بوو زۆر سوپاس، ئەی خۆ ئەڵێن لە دەرەوەی بەرگە هەواوە زۆر بچووک ئەنوێنێ.

زوبێر: ئەی وایە، تۆ ئەزانی ئەو هەموو دوورییە چەند بچووکی ئەکاتەوە؟ تۆ هەر بچۆ سەر ئەو شاخەو سەیرێکی ماڵی ئێمە بکە، بزانە هیچی وای ئەمێنێتەوە؟

ئامۆ: ڕاستە قوربان.. بەڵام من لە ئاستی جەنابتا نە حەددی ئەوەم هەیە خۆر بم و نە ئەستێرە سیوەیلەکە.. من بچووکیت ئەکەم بەردەوام.. بەڵام سوپاس بۆ ئەو وانە گرنگەش.

نیگار: ئەوە شەو و ڕۆژ ئەخوێنێتەوەو ماڵی ئاوا بێ هەمووشیم بۆ ئەگێڕێتەوە هههە.

زوبێر: ئەی نامەوێ ئەو چاوە جوانانەی ماندوو بێ.

نیگار: زۆۆۆرر سوپاس، قوربانت.

ئامۆ: وتم ڕەنگە چەند ڕۆژێک بێ، کەس پیاسەیەکی دەرەوەی پێ نەکردبێ، با بچمە خزمەتی. ڕاستییەکەی ئەبووایە دوێنێ بێم، ئیتر نەمپەرژا.

سەلوا: وەڵا من تا حەوشەکەم برد، کەچی زوو بێزار بوو هاتینەوە ژوورەوە.

ئامۆ: ئاخر من قسەی خۆشی بۆ ئەکەم و نوکتەی بۆ ئەگێڕمەوەو هەر زۆر شتیتریش.

زوبێر: لە هەمووی گرنگتر غەریزەی دەسکەوتنی سامانم ئەجوڵێنێ هههە کە دێت تەواو ئەو ئارەزووەشم تێر ئەکا.

ئامۆ: هەرچییەکمان هەیە بە هەموو لایەکمان هەر هەمووی لە خزمەتتایە.

زوبێر: کورە گاڵتە ئەکەم، تازە سامان بە من چی؟ من لێبوومەوە.. وەرە بمبەو با بڕۆۆۆین کاکە ئامۆ، بەڵام ئەمڕۆ تا دوکانی سەرسیلەکەش ئەچین.

ئامۆ: تۆ ئەمر ئەکەی مامی من.

(( بردنە دەرەوەی زوبێر))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٢ – ڕ / ن – ماڵی باوکی حمەخدر:

(( باوکی خدر بەرماڵەکەی بە دەستەوەیە، هەرمێ خەریکی بژاردنی برنجە))

هەرمێ: خۆ بانگی نەفەرمووە، چ پەلەتە؟

باوک: منیش گوێ قولاغم جارێ.. (( دەنگی بانگ دێت)) ئەوە فەرمووی.. ئەگەر سەرم لێ تێک نەدەی ڕۆڵە من کاتەکەی باش ئەزانم. (( دەست ئەکا بە نوێژ کردن))

(( پاش کەمێک دەنگی گوڵزار دێت لە دەرەوە.. هەرمێ گیان هەرمێ.. هەرمێ.. هەرمێ برنجەکە دائەنێت و بە پەلە ئەچێتە دەرەوە))

———— تابع ———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٦٤٣ – متبوع – ڕ / د – بەر دەرگا یان هەیوانی ماڵی باوکی خدر:

(( ئەگەر بەر هەیوانەکە لە تەنیشتەوە بڕوانێتە سەر دەرەوەیەکی نزم، کە ڕێگەی هاتوچۆ هەبێت لەوێوە بۆ سەر ڕێگەیەک یان ناودێ، جوانترە.. وەگەر نا هەرمێ ئەچێتە بەردەرگا ))

هەرمێ: فەرموو!

گوڵزار: تۆ هەرمێیت بەساقە؟

هەرمێ: بەڵێ چاوەکەم، ئەی تۆ کێیت؟

گوڵزار: من گوڵەی کاکەوڵام.. زەحمەت نەبێ بێیتە ناو سەیارەکەوە، تا لای کاک حەمەخدری برات ئەچین، لەسەر ئەو یاڵەیە، وتی تەنها هەرمێم بۆ بانگکەن.

هەرمێ: چیت لە من ئەوێ؟ کاکم قەت پێم ناڵێ هەرمێ.. تۆ منت بۆچییە؟ چیت لە من ئەوێ با هەموو ئاوایی نەهێنمە سەیرت؟!

گوڵزار(( دەمانچە دەرئەهێنێ و ئاراستەی سکی ئەکا)):

# (( ئەڵقەی حەفتاو هەشت ))

گوڵزار: وەرەو بە ئاقڵیی سواری ئەو سەیارەیەبە.. دەنگە دەنگم ناوێ چەتیو.. ئەگینا هەر لێرە کۆتاییت پێ ئەهێنم.

(( هەرمێ بە هێواشی پێشی ئەکەوێ و ئەویش دەمانچەی لە پشتی گیر کردووە.. سەرئەکەون و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٤ – ڕ / د – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕێبوار دێتە لای دەرگای سەکنەوە ئەیەوێ دەرگا بکاتەوەو ڕەوەز دایخستووە جامی بۆ ئەکاتەوە ))

ڕەوەز(( گرژ)): بێ ئەقڵ نەموت لە تەلەفونا هیچ نالێی؟

ڕێبوار(( شەرمەزار)): هیچم نەوت کاکە ڕەوەز تەنها وتم تافانم بینی و هیچیتر.

ڕەوەز: جا ئەوە کەمە بێ مێشک؟ هەزارجارم وتووە، تەلەفون تەنها بۆ کات و شوێنی یەکتر بینینە، نەک ناوی خەڵکیتر بێنێ (( دەرگای بۆ ئەکاتەوە)) دەی وەرە کەللەپووت، بزانم چی ئەڵێ؟

ڕێبوار(( دەرگا ئەکاتەوەو سەرئەکەوێ)): قوربان ئەڵێ لە هەر سێ کاروانێکا، چارەکی داهاتی کاروانێکیان بۆ من بێ، چونکە مەترسییەکە بۆ منە.

ڕەوەز: ئەی دوو کاروانەکەیتر؟

ڕێبوار: قوربان ئەو دووەیتر کرێی لەسەر وەرئەگرێ.

ڕەوەز: وەڵا تافانیشمان لێ هەڵئەکەوێ.. با بزانم، تا دوو سبەی کاتمان لەبەردەمایە، با ئەمشەو لەگەڵ زاهیدیش باسی بکەم.

ڕێبوار: باشە قوربان گیان.

ڕەوەز: دەی تێگەیشتم، تۆ بڕۆ.

(( دابەزینی ڕێبوارو ڕۆشتن و خواحافیزیی))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٥ – ڕ/ د – بەر کۆمپانیای ئاوا:

(( خدر بەرەو کۆمپانیا ئەچێت و زەنگی بۆ دێت))

خدر: بەڵێ باوکە گیان سڵاو؟

باوک(( دەنگ)): سڵاو ڕۆڵە.. بچۆ ئەو کچە بدۆزەرەوە کوڕم.

خدر: کچ کێیە؟

باوک: هەرمێ، هەرمێی خوشکت، هاتن فڕاندیان.

خدر: ئەوە تۆ ئەڵێی چی باوکە؟ کێ فڕاندی؟

باوک: وەڵا بزانە خۆت لەگەڵ کێیا بەزمت هەیە، ئەوە فڕاندوێتی، من چوزانم.

خدر: کەی؟ نەتزانی کێ بوون؟

باوک: من نوێژم ئەکرد، بەس گوێم لە دەنگی کچێک بوو، ئیتر دیار نەما.

خدر: نوێژی کەی؟

باوک: نوێژی عەسر.

خدر: جا باوکە وا سەعات ئەبێ تازە بە من ئەڵێی؟

باوک: دەی من چوزانم، وتم دیارە چووە بۆ ناودێ، تا سۆراخم کردو ئەوە تۆزێکە مامە ڕەزای سەرکەلیان وتی لە ڕێ لە سەیارەیەکا بینیومە خەڵکی تیا بوو.

خدر: باشە باوە گیان تۆ خوات لەگەڵ.

(( خدر بە پەلە کوڕەکان بانگ ئەکات و یەکیان ئەچێ بەدوای نارەوەناو ئەویتر بەدوای تریفەیا، ئەوانیش بە ڕاکردن دێن.. تا ئەوان دێن خدر ئەچێتە سەیارەکەی خۆیەوەو بە کارەو دلە ئەڵێ دوایکەون و بە ئەحە هاوکاریش ئەڵێ بێنە سەیارەکەی خۆیەوە، هاوڕێش لەگەڵ تریفەدا دێت، کە هەموو ئەگەن))

خدر: هاوڕێ گیان تۆ بە پەلە دەرگاوبانی کۆمپانیاکە داخە.

نارەوەن: وەیرۆ چی ڕوویداوە؟

خدر: خێرا سەرکەون کاتم لە بەردەما نییە، هەرمێ فڕێنراوە.

نارەوەن: ئەک سەرم لە قوڕنێم بۆ خۆم.

تریفە: کەی؟

خدر: کاتی نییە سەرکەون با ئێوە ببەینەوە، بەڵکو فریای ڕێگاکە بکەوم.

نارەوەن: تۆ بڕۆ ئێمە بەسەیارەکەی کارە ئەڕۆینەوە.

خدر: باشە عەبە تۆش لەگەڵ من وەرەو سەفین تۆش لەگەڵ ئەوانا.

(( خدر بە خێرایی دەرئەچێت و نارەوەن و تریفەش ئەچنە سەیارەی کارەو دڵەوە، کە سەفینیش لەگەلیانا سەرئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٦ – ڕ/ د – سەرڕگای گشتیی قیر – ناو سەیارەکەی سەرچڵ:

(( سەرچڵ و گوڵزارو لاوێن و هەرمێ))

سەرچڵ: ئا تۆ دەمی ئەو دەمەوەرەم بۆ داخە، لە توانامانەما، با یەک فیشەک نەنێم بەسەریەوە.

گوڵزار: وریابە، ئەوە جادە گڵەکەیە کە ئەبێ لابدەین، ئەگینا ئەکەوینە سەیتەرەکەوە.

سەرچڵ: بۆ بە چەلەحانێکەی هیچی بیر هێشتووم؟

هەرمێ: بەسەری باوکت ئەگەر بشمکوژی ئەدۆزرێیتەوە، تۆ کاکەم ناناسی، بە ڕۆژی ڕوناک سەرت ئەپەڕێنێ.

گوڵزار: دەمەدەم بەسە بەس (( هەرمێ کە هەردوو دەستی بەستراوەتەوە، بە لەچکەکەی خۆی گوڵزار دەمی ئەبەستێ)) ئاوا باشە نقەت نەیەت.

(( هەرمێ هەر ئەیەوێ قسە بکە))

لاوێن(( بۆ هەرمێ)): هەر ئاوا حەپەت بێ بە قوربان.. ئۆخە، ئادەی بحەپێنە (( هەرمێ هەر دەنگی قوڕگی دێت)) ئۆخەی ئۆخەی دەی باوانم.

Cut

دیمەنی – ١٦٤٧ – ش/ د بەردەرگای ماڵی نارەوەن / ناو سەیارەی خدر:

(( خدر دێتەوەو لەبەر ماڵی نارەوەن ئەوەستێ، سەفین و ئەحەو هاوکاری لەگەڵدایە))

خدر: ئێوە لێرە بن، زۆرم پێ ناچێ.

ئەوان: بەسەرچاو.

(( خدر دائەبەزێت و ئەچێت بۆ ماڵی نارەوەن))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٨ – ش / ن – ماڵی گێلاس:

(( گێلاس و ئاواو نینا ))

ئاوا: هەفتەی داهاتوو ئەڕۆین و لەو بڕوایەدام پێمان بچێ.

گێلاس: دەی سەفەری خۆشیی و سەلامەتیتان بێ ئیشەڵڵا.

نینا: چیت پێویستە لەگەڵ دەستی خۆما بۆت بێنمەوە.

گێلاس: هەر خۆشیتان بەقوربانت بم، درێغیتان نەکردووە.

ئاوا: جا ئەو چوزانێ چی پێویستە؟ لەگەڵ خۆمانا شتی جوانی بۆ ئەهێنینەوە، تۆ بڵێی بێبەشی بکەین.

گێلاس: بەقوربانتان بم، هەر خۆتان بە سەلامەتیی وەرنەوە، من هیچم ناوێ.

نینا: ئەی پورێ بۆ ئیشەکان چیت کرد؟

گێلاس: پوورێ لە دەورتگەڕێ ڕەبی! وەڵا وا کاکە دیار چۆتەوە سەر ئیشەکەی باوکی و سۆما گیانیش لە بەیانییەوە ئەچێتە ئوتێلەکە، خۆم ئەچم دەستوری ئەوێی پێ ئەڵێم.

ئاوا: ئەک بە خۆشیی بێ یاخوا.. ئەوە بڕیارە ڕاستەکەیە.

نینا: بەخوا ماوەیەکیتر خۆشت ئەچیتەوە سەر ئیش، لە ماڵەوە چۆن ئەحەوێیتەوە؟

گێلاس: ئیتر خوا ڕەحمکا، بزانین چۆن ئەبێ.

ئاوا: باشترین بڕیارێکیتریش ئەوەیە، خۆت و سۆما ئوتێلەکە بەڕێوەبەرن.

نینا: ئیشەڵڵا تا دێینەوە، خۆی ئەبینینەوە لەسەر ئوتێلەکە.

گێلاس: ئەگەر تەلارەکە تەواوکەین خۆ کەس نییە لەوێ بێ، ناچار ئەبم وا بکەم.

(( نیناو ئاوا سەیری یەک ئەکەن و خەندە ))

Cut

دیمەنی – ١٦٤٩ –ش /ن –ماڵی نارەوەن:

(( خدرو ئامۆو نارەوەن و تریفەو تیرۆژ))

خدر: نا ئیشی شەنیا نییە.

نارەوەن: دە من هەر ئەڵێم ئیشی شەنیایە، کێ دوژمنایەتی لەگەڵ تۆ هەیە لەو سەگە زیاتر، ئەی خەریک نەبوو کوڕەکەش بکوژێ؟.. بە پۆلیست وتووە؟

خدر: پۆلیس و ئاسایش وێنەیان لایەو لیژنەی هاوبەشیان لە زۆر شوێن بڵاو کردۆتەوە.. فەرمانی دادوەریشیان پێیە.

ئامۆ(( گرژ)): باشە ئێمە ڕوو لە کوێکەین ئێستا؟ ئەگەر لەسەرەتاوە ئاگاداری کێشەکانتان بووینایە، ئێستا ئەمانزانی بیربکەینەوەو گومانمان بۆ کەسێک بچوایە.. بەڵام هیچ! ئێوە حسابی کوڕی ماڵەکەمان بۆ ناکەن، دیارە ئێمەتان لە دەرەوەی بازنە داناوە.

خدر: ئیشەکە ئاڵۆزە کاکە ئامۆ.. ئێمە نامانەوێ ئێوە بە گرفتی بچوک و لابەلاوە خەریککەین.. ئەم سەرێشەیە بۆ بئاڵێنینە ئێوەش!

تریفە: دەستی شکاوم بۆ هەرمێ گیان.. ئێستا ئەبێ لە چ وەزعێکا بێ؟

خدر(( زەنگی تەلەفونی دێت)): بەڵێ؟!.......... تۆ کێیت؟ .......... هەرمێلە گیان بەساقەوبم، لە کوێی کاکە؟.................... سەلامەتی؟ ............ نا بەقوربان دڵ لە دڵ مەدە جێت ناهێڵم......... هەرمێلە! هەرمێلە! (( هەرمێ ئەگری))

نارەوەن: ئەڵێ چی حەمە خدر گیان؟

خدر: لای شەنیایە، ئەڵێ جێم مەهێڵە.

ئامۆ: ئەی ئەو مالۆسە لەکوێیە بچین بۆی؟

نارەوەن: کەس نازانێ.. خۆم وتم ئیشی ئەوە.

خدر(( هەڵئەسێ)): تریفە ئەمشەو لێرەبە.. بە یارمەتیتان من ئەڕۆم، شەو نایەمەوە.

ئامۆ: من لەگەڵتا دێم، چۆن ئەهێڵم تەنیا بڕۆی؟

خدر: کەسم ناوێ کاکە ئامۆ گیان، خەڵکم زۆر لەگەڵایە دڵنیابە.. ئەگەر ئەمشەو نەیدۆزمەوە، ئەو کچە زارەترەک ئەبێ.. (( ئەڕوات))

نارەوەن: لێیگەڕێ باوکەکەم، برادەرو دۆستی زۆرە قەینا با بڕوا.

ئامۆ: ئای لەم ڕۆژە ڕەشەی تێیکەوتووین بەدەست ئەو شتە پیسەوە.

تریفە: ئەگەر تۆ بتهێنایە، هیچ شتێک ڕووی نەئەدا.

ئامۆ(( تووڕە)): بۆگەنی وا هی ئەوەیە بێتە ئەم خێزانەوە؟ قسەیەک بکە بچێتە ئەقڵەوە تریفە گیان.

Cut

دیمەنی – ١٦٥٠ – ش/ن – ڤێللای شەنیا:

(( شەنیاو گوڵزارو لاوێن و ئارینا ))

شەنیا: دەستخۆش منیش ئەوەم ئەوێ خزمەتی باشی بکە ئارینا گیان، با کە ناردمانەوە، حمەخدر تەریق بێتەوە.

ئارینا: دوای نان میوەو کێک و کولیچەو شیرینیی و هەرچیمان هەبوو بۆم برد، بە قوزەڵقورتی بێ یاخوا هەهە.

گوڵزار: شوێنەکەیان باش و دوورەدەستە، ئەقڵی گەورە! هەرجارێک پێویستیمان پێی بوو، ئەیهێنین و خزمەتی ئەکەین هاهاها.

لاوێن: بەخوا من گرێیەک لە دڵمایە، نەکرێتەوە ئارام نابمەوە.. ئیشێکم پێ سپێرراو نەمتوانی بیکەم.

گوڵزار: ئەو ئیشە چییە لاوە گیان؟ ئەی بۆ جێبەجێت نەکرد؟

لاوێن: نارەوەن.

شەنیا: ئەوەم بۆ ئاسان کردوون.. نارەوەن چۆن بکوژرێ.. تازە کەس ئێمەی پێ تاوانبار ناکرێ، هەموو وا ئەزانن ڕەوەزو دیدەوانن.. خدر کە عەودالی خوشکەکەی ئەبێ، ئەقڵ ئەڵێ ئەبێ پیاوەکانیشی دوای خۆی بخا.. ئیتر دەرگای نارەوەن ئەکەوێتە سەرپشت و منالێکیش زەفەری پێ ئەبا.. پەلە مەکەن، سبەی دوو سبەی کوڕەکان پێم ئەڵێن لە کوێیەو وەزع چۆن ئەبێ.

گوڵزار: هیچ تیرێک ناهاوی دوو سێ نیشان نەپێکێ.. وەی بەقوربانی ئەو ئەقڵەت بم.. ئای خوایە کە خۆشم ئەوێی.. (( بۆ لاوین)) توخوا ئەوەش پلان بوو تۆ داتنا؟ ئەها بە یەک جووڵە چۆن جەرگیان ئەبڕێ؟

شەنیا: بیرۆکەکەی ئەویش باش بوو، گرنگ بیرکردنەوەیە، بە دڵم بوو..(( وەستانێک)) جا دوای ئەوەی ئەمشەو خدر باش ماندوو ئەبێ لە گەڕان بەدوای خوشکەکەیا.. سبەی خۆم لە شوێنێکی کراوەوە دوور لە شوێنەکانی خۆمانەوە، تەلەفونێکی بۆ ئەکەم.

ئارینا: پێی ئەڵێی لای ئێمەیە؟ دە توخوا پێشی بڵێ ئارینا خزمەتی باشی ئەکا با پاداشتێکم بکا (( پێکەنینی هەمووان))

شەنیا: بەڵێ پێی ئەڵێم، ژیانی خوشکەکەت بارمتەی سەرکەوتنی ئەو ئیشەی تافان و هاوڕێکانییەتی.. هەر ڕووداوێک بێتە پێشەوە، ئیتر خۆت شوێنی پرسەکەی دیاری بکە لە شار ئەبێ، یان ئەیبەیتەوە بۆ دێکەی خۆتان.

گوڵزار: ئەی وا هات و بە حوکمەتی وت؟

شەنیا: ئەوەش چاوەڕوان کراوە، ڕەنگە ئەو بیر لەوە بکاتەوە هەواڵەکە بدا بە حوکمەت.. بەڵام خوشکەکەی بەرامبەر یەک: خۆدزینەوەی فڕێنراوە ڕۆڵە.. دوو: ئەمەی من کردم بۆ پاراستنی ئێوەیە لە هەر مەترسییەک. ئەی ئاگات لێ نەبوو بە بیانووی هاوسەرگیرییەوە خۆی دزییەوە؟ هەرچییەکیش بکا، خۆی زەرەر ئەکا

Cut

دیمەنی – ١٦٥١ – ش/ن – ماڵی مریەم:

(( سەمەدو کامیل و مریەم پێ ئەکەنن))

مریەم(( پێکەنین)): بێ ئارەقە هەر هەموویان بوون بە داوەکەمەوە.. با بچن بیکڕن، بەلاٚمکە هاتنەوە کڕیارەکانیان هەڵفڕیون، کەسیان تا ماون نایەنەوە بەمناوەیا.

سەمەد: چۆن ئەوێرن بێنەوە، کە پێمانوتن ئەمە داوی ئاسایشەو ئەگیرێن، هەر لە ترسا نەیانزانی چی بکەن، یەکێکیان لە تاوا دەستی ماچ کردم هههە.

کامیل: داوای هەرچەندمان بکردایە سەریان پێوە نەبوو، ئەیاندایێ. هههە.

مریەم: جا یان ئەبێ بیگێڕنەوە بۆ جێی خۆی و بە نیوە قیمەت بیفرۆشنەوە؟ یان ئەیهێننە خزمەتی خۆمان و بە دڵی خۆمان نرخی لەسەر دائەنێین.. ئەی ئیتر ئیش وایە، ڕۆژێ قازانجی گەورەو .........

سەمەد(( بۆی تەواو ئەکا)): ڕۆژێکیش تیاچوون.

(( پێکەنینی بەکوڵی هەرسێکیان))

Cut

دیمەنی – ١٦٥٢ – ش/ن – ناو مینی مارکێتێک:

(( خدر تەماشای تۆمارکراوەکانی کامێرایەکی چاودێریی ئەکات))

دوکاندار: گەورەم ئەو کابرایە چەندجارێک چۆتە بەردەرگاو قسەی لەگەڵ ئەو ژنە کردووە.

خدر: ئەوە واز لێ بێنە.. ئەو سەیارەیەی زۆرترین جار بەوێدا تێپەڕ بووە لە ناوەختا.

دوکاندار: سەرچاوم گەورەم (( پاش کەمێک)) گەورەم ئەم سەیارەیەش هەیە، سێ جار بەوێدا ڕۆشتووە، بەڵام لەبەردەمی ئەو ماڵەیا هەڵوێستە ئەکا.

خدر: ئادەی!!! (( ئەگەر نیشان بدرێت، سەیارەکەی سەرچڵە)) ئادەی بیگێڕەوە، بیخەرە دوای چوونە ژوورەوەی من و ژنەکەیتر بۆ ماڵەکە.

دوکاندار: سەرچاوم.

خدر(( پاش کەمێک)): ئۆو دوو سەیارەیە، ژمارەکانیانم بە کامێراکەیتر بۆ نزیک بخەرەوە.. دەستخۆش.

Cut

| | |
|---|---|
| دیمەنی – ١٦٥٣ – ش/ د – حەوشەی ماڵی زوبێر:<br>(( زوبێر ڕۆبێکی بە شانەوەیەو بە تەنها لەسەر عەرەبانەکەیەتی، تێل ئەکا ))<br>زوبێر: ١- نا کاکە خەمت نەبێ، سەلوا هێنامیە دەرەوەو وتم کەمێ بێتاوەتم لێمگەڕێ تەنیابم ............٢- نە کاکە تۆ خەمی ئەوەت نەبێ، پێم بڵێ چیتان کرد؟ .......... ٣- ئەی تۆ بۆ ناچی هەواڵ بگەیەنیتە پۆلیس؟ هەر ئەو چارەسەرە هەیە...........٤- دەی پیاو نازانێ چی بڵێ، ئەقڵم بۆ هیچیتر ناچێ، لەم کاتەیا هاوکاریت بکا.. مەگەر هەر ئەوەندەی بڵێم چاوت لە خوشکەکان و دایکت بێ و جێیان مەهێڵە، چاوی نەخۆشخانە دەرئەهات.........٥- نا کوڕم دایک و خوشکەکەت لە پێشترن.<br>———— Cut ———— | دیمەنی – ١٦٥٤ – ش/ د – حەوشەی ماڵی نارەوەن:<br>(( ئامۆ هەر جلی دەرەوەی لەبەرایەو تێل ئەکا ))<br>ئامۆ: ١- ئاخر سەرمات ئەبێ مامە گیان....... ٢- هیچمان پێ ناکرێ.. خوشکەکەی حمەخدریش هەر لای شەنیایەو جێی نادیارییە،ئێ خۆ عینادەکەش ناهێڵێ بچم لەگەڵیا، ئەگینا لەسەر قسەکەی جەنابت پێموت.. ئەڵێ خەڵم زۆر لەگەڵایە........... ٣- خۆی و دایکم ناهێڵن، ئەڵێن تەشەنە ئەکاو مناڵەکانیتریش ئەگرێتەوە ........ ٤- هەر ئەوەم لە دەستدێ مامە زوبێر، خەمت نەبێ هەمووی جۆر ئەکەم، سەری نەخۆشخانەش ئەدەم..... ٥- سوپاس مامە گیان سوپاس.<br>———— Cut ———— |

دیمەنی – ١٦٥٥ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( خدرو نارەوەن ))

خدر: کردویّتی بە بارمتە.. بەڵام خۆم ئەزانم چۆن ئاگر لەسەر کلکی ئەکەمەوە.. شەنیا بە تاوانی کوشتنی دڵنیا، لە دادگا فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرئەچێ، لەبەرئەوەی پێشتر سوور بووە لەسەر کوشتنی.

نارەوەن: جا ئەگیرێ؟

خدر: ئەو سەیارەیەمان دەستکەوێ، شوێنیشی ئەزانین.. لە بەیانیشەوە کارەم ناردووە لەو دەوروبەرەو ناو بازاڕیش چاو بۆ ئەو ژمارەیە بگێڕێ.

نارەوەن: جا بۆ دڵەش بە لایەکیترا نانێری، ئێرە ترسی نییە، وا هاوکارو ئەحەشی لێیە، خەمی منت نەبێ.

خدر: مەگەر بچێ لە ماڵەوە سەیارەکەی تۆ یان تریفە بێنێ؟!

نارەوەن: ها ئەوە سویچی سەیارەکەم، با تریفە دوور بێ لە هەموو شتێکەوە.. ئەوەی من باشترە.

خدر: ئۆکەی، با ئەوەی تۆ ببا.. پێش ئەوەی ئەو ئیشەی تەواو بکرێ و تلیاکەکە بگاتە دەستیان، من ئەبێ هەرمێم ئازاد کردبێ، ئەگینا تیائەچێ.

نارەوەن: نا ئیشەڵڵا هیچ نابێ، بەڵام زۆر پێویستە بدۆزرێتەوە.

خدر(( هەڵئەسێ )): دەی با دڵەش بنێرم بە لایەکا.(( چوونە دەرەوەی خدرو ئەگەڕێتەوە )) بە ئەحەو هاوکاریش ئەڵێم واز لە هەموو شتێک بێنن و بچنە جێیەکەی دڵەو کارە.

نارەوەن: دەستخۆش.

Cut

دیمەنی – ١٦٥٦ – ڕ / د – بەردەرگای ماڵی تازەی دیدەوان:

(( ساماڵ و سەرخێڵ وەستاون و دیدەوان دێتە دەرەوە))

دیدەوان: ئامادەن؟

ساماڵ: بەڵێ گەورەم، بەڵام ئەوە سەیارەیە بۆ بە پێ بڕۆین؟

دیدەوان: فێر ئەبن ڕۆڵە فێر ئەبن.

سەرخێڵ: من کێشەم نییە، حەز ئەکەی بەشاخا هەڵزنێین.

ساماڵ: ئێوارە مەرحەبایەکت ئەکەمەوە.. (( بۆ دیدەوان)) گەورەم بەرەو کوێ؟

دیدەوان: ئێوە دوامکەون و خۆتان بە پرسیارەوە خەریک مەکەن.. ئەچین بۆ پارە کۆکردنەوە.. زۆر درەنگە.. دوانیتریشم ئامادە کردووە جیا لە ڕەوەزو ئەوان دوو سبەی بچن کاروانێک بێنن.. بزانین ئەوان چۆن دەرئەچن؟

ساماڵ: وەڵا ڕەوەز هەر بە یەکجاریی دەنگی بڕا.

دیدەوان: پەلەمان نییە، ئێمە کەروێشک بە عەرەبانە ئەگرین، بەڵام ئەوەندە ئەزانم سەری خۆی لەسەر دائەنێ.

ساماڵ: تەبعەن بە دەستی ئێمە.

(( ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٦٥٧ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( سەرکۆو کۆژین و ڕاهۆز))

سەرکۆ: کەواتە سبەی لە سێ قۆڵەوە دەرئەچن؟

ڕاهۆز: بڕیار وایە.

سەرکۆ: بەڕێزەکان ئەبێ ئەمجارە لە ڕیشە هەڵکێشانی ئەو گروپە بێ بە یەکجاریی.. سەرچاوەی دارایی یەکەمیان وشک کراوەو دووەمیش لەبەردەستماندایە.. سەری مارەکەش لە داوەکەدایە بە هەموو دۆست و ناسیاوەکانییەوە.. ئەگەر هەر یەکێکیان ئەمجارە دەربازی بێت، ڕەگ زیندوو ئەکاتەوە، ئەبێ ڕێ لەوە بگرین.

کۆژین: وەک فەرمانت کرد، من لەگەڵ قۆڵی دیدەوانا ئەبم.

ڕاهۆز: منیش خۆم سەرپەرشتیی قۆڵەکەی شەنیا ئەکەم و کاک حەمە خدریش لە هەولی دۆزینەوەی شوێنەکانیاندایەو مولازم هەریاریش ئەنێرم بەرەو قۆڵی ڕەوەز.

سەرکۆ: کێشەمان ئەو تافانەیە، ڕەنگە ئەگەر نەینێرین بۆ ڕەوەز، ئەوان دەستی لێ لێ بوەشێنن، ئەگەر نەینێرین بۆ شەنیاش ئەوا شتێک لە خوشکەکەی حەمەخدر بکەن.

ڕاهۆز: گەورەم گەر بفەرمووی، شوێنی تافان لای ڕەوەز پڕ ئەکەمەوە، بۆ ئەوەی سەرچاوەکەی سەر سنوری ئەویش دەسگیر بکەین.

سەرکۆ: باشترە قسەیەک لەگەڵ حمەخدر بکەیت، بزانە ڕای چییە؟

Cut

دیمەنی – ١٦٥٨ – ڕ / د – سەر شەقامی گشتیی – ناو سەیارەی دڵە:

(( دڵە بە سەیارەکەی نارەوەن وەستاوەو سەرچڵ و گەنجێکیتر بە سەیارە بە بەردەمیا ئەڕۆن و دڵە دوایان ئەکەوێت و تەلەفون ئەکا ))

دڵە: کاک حمەخدر گیان من ئێستا بە دوای سەیارەکەوەم چی بکەم؟

خدر(( دەنگ – بە پەرۆشەوە )): نزیکترین شوێنم لە خۆتەوە پێ بڵێ.

دڵە: ڕێک لە جادەی پشتی کۆمپانیاکەی کاک ئاواوە.

خدر: زۆر باشە، ئەگەمە سەرت، دوای ئەوەی من گەیشتم، تۆ بیدەرە دەست منەوەو چاودێریی من بکە نەک ئەوان.

دڵە: بەسەرچاو، وا ئیشارەتی جادەی بەردەم کۆمپانیاکەی هەڵکرد.

خدر: هەر زۆر باشە کەواتە من لەبەر کۆمپانیاکە ئەوەستم.

——— تابع ——————— Cut ———————————

دیمەنی – ١٦٥٩ – متبوع – ڕ / د – بەردەمی کۆمپانیای ئاوا:

(( خدر لە دەرگاوە بە پەلە ڕا ئەکا بۆ سەیارەکەی، کە لە بەردەمی کۆمپانیادا وەستاوەو خۆی هەڵئەداتە ناویەوەو دائەنیشێت.. سەیارەکەی سەرچڵ دێت و بە پەنجا مەترێک پێش ئەوەی بگاتە کۆمپانیاکە ئەوەستێت.. گەنجێک دائەبەزێت و بە پێ بەرەو کۆمپانیاکە دێت.. سەرچڵ ئەڕوات و خدر دوای ئەکەوێت و دڵەش بە دوایا.. گەنجەکە دێتە بەردەمی کۆمپانیاکەو چاو ئەگێڕێ))

ئەحە: ها فەرموو!

گەنج: کاک ئاوام ئەویست، لێرەیە؟

ئەحە: نەخێر لێرە نییە.

گەنج: ئەی کەی دێتەوە؟

ئەحە: ئەتوانی بچی لە دایکی بپرسی لە سەرەوەیە، من نازانم.

گەنج: زۆر باشە سوپاس، کە دایکی لێرەبێ ئەو ئەزانێ.(( ئەیەوێ بەرەو ژوورە بچێ، هاوکار پێشی لێ ئەگرێ))

هاوکار: نا لێرە بوەستە.. کاک ئەحمەد خۆت بچۆ بزانە کەی دێتەوە.

ئەحە: مامە حمە خدر وتی ئێرە جێ نەهێڵن بۆ هیچ شتێک، با خۆی بچێ.

هاوکار: ئای خوایە لەدەست تۆ!

(( ئاواو نینا بەرەو لایان دێن))

ئەحە: باشتر ئەوە خۆی پەیابوو.

(( گەنجەکە کە نیناو ئاوا ئەبینێ، کەمێک دێتە دواوەو بەرەو ئەوان و زۆر بە خێرایی ڕائەکا، ئاواو نینا پێیان سەیر ئەبێ هاوکار دوای ئەکەوێ و لە چاو ون ئەبن.))

ـــــــــــ ربط ـــــــــــــــــــــــــ Cut ـــــــــــــــــــــــــــ

دیمەنی – ١٦٦٠ – ڕ/ د – ڤێللای شەنیا:

(( شەنیاو ئاریناو لاوێن و گوڵزار))

گوڵزار: وایە نابێ تۆ بێیتە ناو شار، خدر بەو ڕوخسارەی ترو بەو گۆڕانکارییەوە ببینیوتی، نەک توشی ببێ بە تووشتەوە.

لاوێن: خۆمان ئەچین و کاک سەرچڵ و کوڕەکانیش ئەبینین.. پلانی بەیانییش وەک خۆت وتت، بەو شێوەیە تێیان ئەگەیەنین.

شەنیا: باشە گیان، دەستتان خۆش.. قسەیەکیش لەگەڵ ئەو تافانە بکەن، بەڵام ئاممان لەم دەوروبەرە تێل نەکەن، لە ماڵەکەی شاریشەوە نزیک نەبن، با جێمان ئاشکرا نەبێ.

گوڵزار: هیچ خەمت نەبێ، کێشە ناخوڵقێنین.

ئارینا: من هەر خزمەتی هەرمێ و هەڵوژەکە بکەم؟هههه

گوڵزار: ئیتر قسمەتەکە وایە گوڵم.

ئارینا: وەڵاهی بەدەست من بێ، ناودەمی ئەهاڕم، ئەوەندەم ڕق لێیەتی.

Cut

دیمەنی – ١٦٦١ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٥٩ – ڕ/ د – ناو سەیارەی خدر – لە گەڕەکێکدا:

(( خدر تێل ئەکا ))

خدر: دڵە گیان وەرە پێشەوە لێم وەرگرە، با ئەوەندە بە دوایەوە نەبم.. هەر ماوەیەک بڕۆن و خۆم لێت وەرئەگرمەوە.

دڵە (( دەنگ )): بەسەرچاو، خۆت لادە با پێشکەوم.

خدر: ئێستا چواریی هەڵئەکەم و لا ئەدەم، تۆ پێشکەوە، قوربانتم ونی نەکەی.. مۆبایلەکەش دامەخەرەوە با ئاگامان لە یەک بێ.

دڵە: فەرموو.

(( خدر چواریی هەڵئەکات و ئەوەستێ، دڵە پێش ئەکەوێ ))

———— ربط ———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٦٦٢ – ڕ / ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( ئاواو نیناو نارەوەن))

ئاوا: جا خۆ هاوکار نەبووایە ئێستا قەومابوو.

نینا: نەوەڵا بستێ لێت دوور ناکەوینەوە، ڕۆشتنی چی؟ خوشکی کاک حمەخدر فڕێنرابێ و گوێی شەیتان کەڕ بێ هەوڵی کوشتنی تۆ بدرێ، ئیتر بە چ دڵێکەوە گەشت و گەڕان بکەین؟

نارەوەن: بابە من لێرە سەلامەتم و کەس دەستی نامگاتێ.. بچمەوە ئەوبەر زۆر لە ڕووترە.. ئێوە بڕۆن و هیچ خەمتان نەبێ.. حمەخدر چەند پیاوێکی زۆری لەم دەوروبەرە کۆکردۆتەوە.

ئاوا: ئای لەو پیاوە خوێڕیانەی کۆی کردۆتەوە؟ خۆ ئەحە کابرای ئیزنداوە هەڵکوتێتە سەرت؟

نارەوەن: هاوکاری لێیە ترسم نییە.

ئاوا: تۆ ئیتر لە من جیا نابینتەوە با پێت بڵێم، هاتن و چوونیشت هەر لەگەڵ منا ئەبێ، با کاک حمە خدریش هەناسەیەک بداو بە دوای خوشکەکەی خۆیا بگەڕێ.. تەواو ئەوە بڕیارە.

نارەوەن(( خەندە)): بۆ حەمە ئاوا گیان تۆش چەک هەڵئەگری؟

نینا: مۆڵەتی حوکمەتیشی بۆ وەرگرتووە ئەی چۆن؟ منیش هەر لەگەڵتانا ئەبم.. بۆ خۆمان ئیتر باشتر ئاگامان لە یەکتر ئەبێ.

_______________ Cut _______________

دیمەنی – ١٦٦٣ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٥٩ – ڕ / د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

(( سەرچڵ تێل ئەکا ))

سەرچڵ: گوڵە زۆرت پێ نەچێ، ها ئەگینا لە بری خوشکەکەی ئەمبا.

گوڵزار(( دەنگ )): تەقەی بۆ لێناکەی؟ تەقەی لێ بکە.

سەرچڵ: دوو سەیارەن چەتیو تەقەی چی؟ خۆ مەرج هەر تەقەکە نییە، هەموو سەرکۆڵانێ مەفرەزەی پۆلیسە، چۆن شتی وا ئەکەم؟ تۆ خێراکە، من بەرەو ئەو فلکەیە ئەچم کە پێموتی.

گوڵزار: کە هاتم چی بکەم؟

سەرچڵ: هەوڵبە بگەیتە پشتی من و پێشی لێ بگرەو خاو برۆ، نەهێڵی دەربچێ ها! من خێرا بۆی دەرئەچم و خۆم ون ئەکەم.

گوڵزار: دەی وا من نزیک بوومەتەوە، تۆش خێرا بگەرە ئێرە، بەڵام ئەو من ئەناسێ، خۆم دائەبەزم و سەیارەکە ئەدەم بە لاوێن.

سەرچڵ: دەستخۆش، زۆر باش ئەکەی.

لاوێن: منیشی بینیوە.

گوڵزار: لاوێن ئەڵێ منیشی بینیوە.

سەرچڵ: دەی کەواتە خۆت بەری لێبگرەو دواتر دەرچۆ.

گوڵزار: ناکرێ کاکە، وا نابێ.. ئێستا یەکێ لە کوڕەکان بانگ ئەکەم و بە پەلە ئەیهێنمە شوێنێک کە بۆ تۆ دەست بدا.

سەرچڵ: دەی بزانە کامیان ئەتوانن ئەوە بکەن، پێم بڵێ با خۆم قسەی لەگەڵ بکەم.

——— ربط ——— Cut ———

دیمەنی – ١٦٦٤ – ڕ/ د – سەر شۆستەی شەقام:

(( دیدەوان و ساماڵ و سەرخێڵ))

سامال: هیچ هاتە پێشەوە؟

دیدەوان: وتی لە خزمەتدام، شەوێ پارەی تەواوم بۆ ئەنێرێ و پارەی کەسی تێناخەین.

سامال: یەعنی عارف و هەورازیش بۆ دەرەوە؟

دیدەوان: ئەی کە پارەی ئەوانی تیا نەبێ، ئیتر بۆ حازرخۆری بەر سێبەر بن.. ناوەڵا هەر سەریشیان لێ ئەشێوێنم.

سەرخێڵ: کەواتە ئێستا بچین بۆ لای ئەو دووەی کە ئیشەکە ئەکەن.

دیدەوان: نیوەڕۆ لە چێشتخانەیەک کاتمان داناوە.. خەمتان نەبێ خواخوای ئیشێکیانە.

Cut

دیمەنی – ١٦٦٥ – ڕ / د – بەردەمی ڤێللای شەنیا:

(( شەنیا لەچکی کردووەو عەینەکی گەورە لە چاویا.. لەناو سەیارەکەیە دەربچێ، ئارینا لە بەردەمیا وەستاوە))

شەنیا: ئاگات لەو کچە بێ باوانم.. وریای بە ڕانەکا.. ئەو جۆرە کچانە جیڕن، ڕەنگە من و تۆ دەرەقەتیان نەیەین.

ئارینا: لەگەڵ منا پێی ناکرێ بێخەمبە گەورەم.

شەنیا: ئاخر وریابە دەرگای ژوورەکەی نەکەیتەوە، هەرچەندی دواشکەوتین و هاواری برسێتیی کرد، نانی بۆ نەبەی.

ئارینا: بەسەرچاو.. ئەی بڕیار نەبوو تۆ نەچی؟

شەنیا: ناکرێ، یەک هەڵەی بچووک بکەن، هەموو شتێک لە گرێژنە دەرئەچێ.

ئارینا: دەی بەسەلامەتیی.. بەس توخوا زوو وەرنەوە.

شەنیا: هەر ئیشەکان ڕێک ئەخەم و ئەوانیش نەیەنەوە، من هەر دێمەوە بۆ لات، دڵم لات ئەبێ.

ئارینا: زۆر سوپاس.

Cut

دیمەنی – ١٦٦٦ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٦٣ – ڕ / د – ناو سەیارەی خدر:

(( خدر بە دوای سەرچڵەوەیە، تێل ئەکا ))

خدر: نەخێر جارێ ڕێگەکان کراوەیەو یەک ئاراستە نییە.. گەیشتینە سەر ڕاستە هێڵ، پێت ئەڵێم، (( سەیارەیەک ئەکەوێتە نێوانیانەوە )) سەیارەیەک کەوتە نێوانمانەوە، با تێیپەڕێنم جارێ.. قسەت لەگەڵ ئەکەمەوە.

ڕاهۆز (( دەنگ )): من ئامادەم، هەر ئاراستەکەم بۆ دیاریکە، ئەچین پێشی لێ ئەگرین.

خدر: زۆر سوپاس کاک ڕاهۆز گیان، وا ئەکەم، وا جارێ ئەو سەیارە نەفرەتییە بەردەمی گرتووم.. بە یارمەتی، قسە ئەکەینەوە.

# (( ئەڵقەی حەفتاو نۆ ))

(( خدر هۆڕنی زۆر بۆ سەیارەکە لێئەداو ئەویش لە جامەکەوە دەست دەرئەهێنێ و بە ئاماژەی ئەو پەلەیەت لە چییە خاو برۆ وەڵام ئەداتەوەو خدر هۆڕنی زیاتری بۆ لێئەداو کابراش هۆڕن لێئەدات و ئەوەستێ و دائەبەزێ، خدر ئەیکا بە هۆڕن لێدان.. کابرا ئەگاتە بەردەمی ))

کابرا: ئەوە چییە برا، ئەڵێی کەبابت پێیەو ناتەوێ سارد بێتەوە.

خدر (( دەمانچە دەرئەهێنێ )): بەردەمم چۆڵکە ئەگینا پێت چۆڵ ئەکەم، خێرا دەی، پەلەکە.

(( کابرا بە پەلە ئەڕوات و سەیارەکەی لەبەردەمدا لائەبات و خدر چاوئەگێڕێ، سەیارەکەی سەرچڵ نابینێ.. خدر ئەچێتە پێشی و دائەبەزێ ))

خدر: نێرراوی ئەوان بووی سەگباب وا بەردەمت گرتم؟ پێم بڵێ ئەو خوێڕییە بۆ کوێ چوو؟

پیاو (( پاڕانەوە )): نە بەزاتی خوا برا هەر ناشزانم باسی کێ ئەکەی ـــــ Cut ـــ

دیمەنی – ١٦٦٧ – ڕ / د – ناو سەیارەی ڕەوەز:

(( ڕەوەزو زاهید ))

ڕەوەز: دەستتان خۆش، چاودێرییەکە زۆر تەواوە، سەعات سێ و نیو بەرەو ماڵەوە ئەگەڕێتەوە.

زاهید: سێ و نیو و یەک دەقە لە ناو دەرگای کۆمپانیاکەیە.. ئەگەر چارەکی بوێ بۆ چوار لەسەر سیلەی کۆڵانەکەیان بین، ئاوێ ئەکەین بە دڵی دیدەوانا.

ڕەوەز: دلێرو ئەو کوڕەی لایەتی، سەعات سێ لای من ئەبن.. نامەوێ تا کاتی جێبەجێ کردنەکە هیچ شتێ بزانن، نە ئیشەکەو نە شوێنەکەش.. دنیا لە هەرزن وردترە وەک ئەڵێن.

زاهید: دەستخۆش، زۆر تەواوە.

ڕەوەز: ئەی خۆ ئەم هەموو ماوەیە پیاز پاک ناکەین، شتێ هەر فێربووین برا هههە.

زاهید: کەواتە ئەمڕۆ نارەوەن خان......

ڕەوەز: انا للە وانا الیە راجعون. (( قاقای پێکەنینیان))

Cut

دیمەنی – ١٦٦٨ – ڕ / ن – چێشتخانەیەک:

(( دیدەوان و دوو کوڕی گەنج دانیشتوون و ساماڵ و سەرخێڵێش لە دوور، لەسەر مێزێکیتر))

دیدەوان: ئەوەی پێموتن ناهێڵن یەک چرکە دوابکەوێ.. ئەگینا هیچ ئیشێکیترتان پێ ناسپێرم.

گەنج: قوربان خۆم شارەزای ئەو جۆرە ئیشانەم، بە دڵی خۆت و لە کاتی خۆیدا هەموو شتێک جێبەجێ ئەکرێ.

دیدەوان: بەڵام وریابن، سکوێرەتی باشی هەیە.. زۆر دڵنیای چوار دەورتان ئەبن و ئەوسا یەکەم فیشەک ئەتەقێنن.. با بەیانی بە دڵی خۆش و گیرفانی پڕەوە سەفەرەکەتان بکەن.

گەنج: شارەزام گەورەم، ئەزانم کەی کاتی جێبەجێ کردنە.

دیدەوان: ئیتر بتانبینم.

گەنج: ئەی ئەو دووانەمان لەگەڵ نابن؟

دیدەوان: نا، ئاگاداری ئەوەی عەسر نیین بە هیچ جۆرێک، پێویستیش ناکا، ئاگادار بن.. ئەوانیش ئیشی خۆیان هەیە.

گەنج: ئەی چۆن نازانن بۆ ئەوە دانیشتووین؟

دیدەوان: پێموتوون لەسەر ئەوەی بەیانی قسە ئەکەین.. خۆ ئێوە لە کاتی گەیشتنەوەی ژنەکە بۆ ماڵەوە دڵنیان؟

گەنج: بەڵێ گەورەم، ئەبێ بیستی بوێ بۆ چوار، ئێمە لەسەر سیلەی کۆڵانەکەیان بین، ئەو سێ و نیو دەوامی کۆمپانیای تەواو ئەبێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٦٩ – ڕ / ن – ژوورەکەی شەنیا – شار:

(( شەنیاو گوڵزارو سەرچڵ و لاوێن))

شەنیا: هەندێجار ڕێکەوتەکە ئەوەندە باش دێتە پێشەوە، لە سەد کات بۆدانان لەبارترە.

سەرچڵ: لە چ بارەیەکەوە ئەڵێی؟ تۆ نازانی چییان پێ کردم، ئەتوت لەزگەن، لە پشتە ملم نەئەبوونەوە، تا ئەو خێرەومەندە کەوتە نێوانمانەوە.

گوڵزار: ئەویش لەو بارەیەوە ئەیڵێ، کوڕەکان هیچیان بەردەست نەبوون، خەمی دنیام لێ هاتبوو.. ئەی ئەگەر ئەو کابرایە نەبووایە، بە دڵنیاییەوە توشی بەڵای قورس ئەبووین.

شەنیا: لەوەی کە سەیارەکەش بۆ خدر ئاشکرا بوو، بەڵام چۆنی دۆزییەوە؟ ئەوەیان جێی گومانە.

سەرچڵ: بۆ چ شتێک باش بوو سەیارەکە بناسێتەوە؟

شەنیا: بیرۆکەیەکم لە خەیاڵایە بۆ ئەوە.

لاوێن: حەتمەن بەوە گەیشتوویتە ئامانج!

شەنیا(( بۆ سەرچڵ)): ئەوەی بەیانیت جێبەجێ کردو سالار سەلامەتە؟

سەرچڵ: بەڵێ ئەویش وەکو من ڕاوڕاوکێی دنیایان پێکردبوو تا ڕزگاری بووە لە دەستیان.. بۆ نەگبەتیی ئاوا خۆی هاتبۆوە، ئەویش بە بیانووی هەواڵپرسینی ئاواوە ویستبووی بچێتە ژوورەوە، ئیتر هەر لەبەر کۆمپانیاوە بە ناو ئەو هەموو بازاڕو قەیسەرییەیا ڕاونرابوو هههە.

گوڵزار: کەواتە ئەمڕۆ ڕۆژی ڕاوڕوکێ بوو.. هههە.

شەنیا: هەر زۆر باشە.. ئێستا خدریش و چواردەورەکەشی وا تێگەیشتوون، کە ڕەوەز ئەیەوێ نارەوەن لەسەر ئیش بکوژێ نەک لە شوێنیتر؟

گوڵزار: وایە هەموو ئەو هەوڵانەی دراوە لەسەر ئیشەکەی بووە.

شەنیا: تۆ باشت کرد سەیارەکەت لەسەر جادە فڕێداوە، بە تایبەت کە بە ناوی ڕاماڵەوەیەو بە تەکسی هاتی.. ئەمە یەک.. دوو، ئەبێ وا بیربکەنەوە کە بەسەیارە خەڵک ئەنێررێ بۆ سەر ئیشەکەی و بەمەش ئیتر چاودێریی هەموو سەیارەیەکیتر ئەکەن.

لاوێن: ڕاستە، ئیتر ئەو ناوە بە سکوێرتی ئەتەنن.

شەنیا: لای ماڵیشەوە هیچ پاسەوانێکی لێ نییە.

گوڵزار: نەخێر، تەنها حمە خدر لەگەڵیایەو ئێستا ژنەکەشی.

شەنیا: ئەوە گەیشتینە ئامانجەکە.. لە کۆڵانی خۆیانا کاتێ دائەبەزێ بەرەو ژوورەوە بچێ، ئەبێ بە نێچیرێکی ئاسان.. وایە؟

سەرچڵ: ئۆو تۆ خەیاڵت بۆ کوێ چووە؟ ئێمە بەیانی سەفەرمان بەدەستەوەیەو تۆش هەر لەسەر بەرنامەی خۆت قسە ئەکەی.

گوڵزار: هەی بتخۆم باشە! ئەو ئەقڵە چییە؟ تۆزێکی بدە بە من.

شەنیا: نا، تۆ ئەقڵت ناوێ، فیشەکت ئەوێ هههە.

سەرچڵ: دەی با گوڵزار بچێ بەسە.. بەڵام ئێستا پێویست بەوە ناکا، کە هاتینەوە باشتر لێمان هەڵئەکەوێ.

شەنیا: نا دڵەکەم.. ئێستا خدر ئەزانێ خوشکیمان زەوتکردووە، ئەزانێ ئێمە بەیانی کاری گەورەمان بە دەستەوەیە.. ئەگەر ئەم عەسرە بکوژرێ، بە چاوی خۆیشی ببینێ باوەڕ ناکا دەستی ئێمەی تیابێ.

گوڵزار(( بۆ سەرچڵ)): واوووو.. ئەم عەسرە بمگەیەنە لای و خۆم ئاودیوی ئەکەم.

دیمەنی – ١٦٧٠ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

(( نارەوەن دانیشتووەو خدر تێل ئەکا))

خدر: تۆ لەگەڵ شەنیا بڕۆ تافان گیان، واز لە ڕێبوارو ڕەوەز بێنە.

تافان (( دەنگ)): باشە بەسەرچاو.. شەنیاو ئەوان پێیان وتووم سەعات پێنج ئامادەبم، ڕێبواریش شەشی پێوتووم، ئەوە زۆر باشە.. قسەیەکیش لەگەڵ هەندرێن بکە زەحمەت نەبێ، بڵێ بە ئیشی من ئەڕوا.

خدر: باشە بەساقە، ئیتر وریای خۆت و منداڵەکان بە.

تافان: ئا بۆ بە هەندرێن ناڵێی ئەمشەو هەموومان بچین بۆ ماڵی باوکم، ئەویش لەوێ بێ، با ماڵ چۆڵ بێ.

خدر: ئەوەش باشە بەسەرچاو، من پێی ئەڵێم.. وا باشترە، کە ڕێبوار هات بزانێ ماڵ چۆڵە. (( بای و خواحافیزیی))

نارەوەن: ئەی کە هاتەوە؟ ڕێبوارو ئەوان لێی ناپرسنەوەو ئازاری نادەن؟

خدر: دڵنیابە ئیتر شتێک نامێنێ بە ناوی گروپی مافیاو بازرگانی بێهۆشکەرەوە.. وا دەوروبەرم چنیون، هەر هەموو ڕاپێچی بەر دادگا ئەکرێن.

نارەوەن: ئەی هەرمێ؟

خدر: ئەوەش لێگەڕێ بۆ خۆم، بەیانی دێتە خزمەتت.

نارەوەن: دەی باشە مادام لەگەڵ تۆ نایەمەوەو ئاواش چەکی پێیە، تۆ بڕۆ بەلای ئیشی خۆتەوەو چاوت لە تریفە بێ، ئەو بگەیەنیتەوە، هههە بیرت نەچێ.

خدر: هەموو دنیام بیرچێ نارە گیان؟ ئەوم بیر ناچێ هاهاها

Cut

دیمەنی – ١٦٧١ – ڕ / د – سەرسیلەی ماڵی نارەوەن:

(( دوو گەنجەکەی لای دیدەوان، بە سەیارەیەک دێن و لەسەر سیلەی کۆڵانەکەی ماڵی نارەوەن ئەوەستن))

گەنج١: ئێرە زۆر باشە، کلاشینکۆفەکەت ئامادەکە.

گەنج٢: هەر ئەمنەکەی ماوە بیترازێنم و سەڵیەی پی بکەم.

گەنج: کەواتە بڵێین خوا عافویکاو ئەمشەوی لە هەموو شەوێکی خۆشتر بێ.

گەنج٢: لە کوێ؟

گەنج١: لە گۆڕەکەیا بە عولبان.

(( چاودێریی ئەکەن))

———— گەڕانەوەی هەیە ———— Cut ————————

دیمەنی – ١٦٧٢ – ڕ / ن – ماڵی شەنیا:

(( گوڵزارو سەرچڵ و لاوێن کڵاشینکۆفیان پێیە لەگەڵ شەنیا بە پێوەن))

شەنیا: گوڵزار تۆ چاوەڕوانی سەیارەکەی دوای ئەوان ئەکەی، هەر دەرکەوت نەهێڵی فریای هیچ بکەوێ، یەکسەر دایاندووره، دووانی تیایە نەهێڵی هەناسە بەرودوا بکەن.. لاوێن و سەرچڵیش بە وردیی تەقە لە نارەوەن ئەکەن، با خدر بەرنەکەوێ، باشە گیانی من.

سەرچڵ: ئیشی خۆمە وەک قەنناس ئەیپێکم، بێ ئەوەی کەسیتر بەرکەوێ.

شەنیا: دەی بەساقەتان بم درەنگە، دەستوبردێ بکەن و پێ هەڵگرن.

گوڵزار(( خۆی لار ئەکاتەوە بەلای شەنیاداو ماچێکی چەناگەی ئەکا)): فەرمانتە ئەی گوڵترین کچ.

Cut

دیمەنی – ١٦٧٣ – ڕ/ن – کۆمپانیای ئاوا:

((نیناو نارەوەن بە پێوەن، ئاوا دێتە ژوورەوە))

ئاوا: ڕێک سێ و نیوە، ئامادەن.

نارەوەن: چاوەڕێی تۆ بووین.

ئاوا: دەی من لە پێشەوەو دایە تۆ بەدوای مناو نینا تۆش لە پشتییەوە.

نارەوەن(( پێکەنین)): ئەڵێی بۆ بەرەی جەنگ ئەچین؟ هههە.

ئاوا: ئەی بەرەی جەنگ نییە چییە؟ ڕۆژ نییە هەوڵی کوشتنت نەدەن، با هەرچییەکت بۆ هات بەر ئێمە کەوێ.

نارەوەن: کورە قەزای ئێوە لە منکەوێ، ئەوە بەڕاستتە؟ بەخوا بەخوا لە پێشتانەوە نەبم، دوو پێم لەم ژوورە نایەتە دەرێ.

نینا: دە با ئاوا لە پێشەوە بێ، خۆ کەس هەوڵی کوشتنی ئەو نادا.

نارەوەن: شتی وا نییەو هەر نابێ.

ئاوا(( ئاماژەی ڕۆشتنی بۆ ئەکا)): دە فەرموو فەرموو دایە گوڵەکەم.

Cut

دیمەنی – ١٦٧٤ – گەڕانەوە بۆ دیمەنی – ١٦٧١ – ڕ/ د – سەر سیلەی ماڵی نارەوەن:

(( سەیارەی دوو گەنجەکە وەستاوەو سەیارەی ڕەوەزو ئەوانیش دێت و لە شوێنێکیترا ئەوەستێ.. پاش کەمێک سەیارەیەکیتر کە بە سەرچڵە، پەیا ئەبێت و ئەیەوێ بوەستێ))

Cut ــــــــــــ ربط

دیمەنی – ١٦٧٥ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٧٤ - ڕ/ د – ناو سەیارەی سەرچڵ:

گوڵزار: سەرچڵ ئەوە ڕەوەز نییە لەو سەیارەیەدا؟

سەرچڵ(( دیقەت ئەدا)): بۆ ئەو نییە، بەرەوەڵا خۆیەتی.

گوڵزار: تۆ بڵێی بووبێت بە پاسەوانی نارەوەن؟

سەرچڵ: کورە ئەوەش زاهیدەو دوانیتریش.

لاوێن: چییە مەترسین؟

سەرچڵ: وەڵا یا بۆ ئێمە دانیشتوون، یان بوون بە پاسەوانی نارەوەن.

لاوێن: ئەی ئەو سەیارەیەیتر؟

گوڵزار: دیارە ئەوانیش پاسەوانن، هەتیو دنیا تەنراوە، چی بکەین؟

سەرچڵ: بڕۆین باشترە، بەخوا هەرسێکمان بەختوخۆڕایی بە طڕان ئەچین.

گوڵزار: چاودێریی باشتر بکەین و بیخەینە ڕۆژێکیتر باشە.

سەرچڵ: ئا هەر هیچ نەبێ لەو مەسەلەیەی ڕەوەز تێ بگەین.

گوڵزار: بەخوا هەر بمانبینێ تەقەمان لێ ئەکا.. بڕۆ سەرچڵ گیان.

سەرچڵ: ئەوە باشترە.

(( سەرچڵ پێی لێ ئەنێت و ئەڕوا))

Cut

دیمەنی – ١٦٧٦ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٧٤ – ڕ/ د – ناو سەیارەی ڕەوەز:

زاهید: ئەرێ ئەم ژنە بوو بەچی؟ ئەوە سەیارەیەک وەستاوەو یەکێکیتریش وەستاو ڕۆشت، هەردووکیان لە پاسەوانی ئەم ژنە ئەچن.

ڕەوەز: دیارە هەرچی پارەی هەیە ئەیدا بە پاسەوان.. زۆر سەیرە، پێش گەڕانەوەی خۆی بەرماڵەکەشی بە چەکدار تەنیوە.

زاهید: باوکم بەسەری جەماعەت، نوزەمان لەبەر ئەبڕن و هەر چوارمان بەسەر یەکا خپ ئەکەن.. بە قسەکەم بکە ڕەوەز، با چاودێریی باشتر بکەین، ئەگەر هەروا بوو، ئەوە دڵنیابە بە ئێمە ناکوژرێ، با خۆی بیکوژێ.

دلێر: وەڵا کە ئەزانن چەکداری زۆر لێیە، نەکردنی باشترە.

ڕەوەز: کورە جا من چۆن خۆم و ئێوەش بۆ هیچ دائەنێم، تێیهەڵدە، هەرکاتێ تۆ ئەڵێی با خۆی بیکوژێ، ئێمە هەقمان چییە بەسەریەوە؟

زاهید: دەبڕۆ تا خۆی دەرنەکەوتووە، ئەویش سەیارەیەکیتری لەگەڵایە، هەر بە کڵاو ئەگیرێین.

(( سەیارەی ڕەوەزیش پێی لێ ئەنێ و بە خێرایی دەرئەچێ))

Cut

دیمەنی – ١٦٧٧ – مربوط بە دیمەنی – ١٦٧٤ – ڕ/ د – ناو سەیارەی دوو گەنجەکە:

گەنج ٢: ئەرێ ئەو دوو سەیارەیە چی بوون وەستان و بە خێرایی دەرچوون؟ بە تایبەت ئەوەی لای خۆمانەوە چاویان بڕیبووە چاومان.

گەنج٢: نازانم، بەڵام ئاسایی نەبوون.. تۆ چی لێ تێگەیشتی؟

گەنج١: ئەوساش پێموتی ئەو سەیارەیە نیازی خراپە.. کابرای سایەق هەر لە تاوانبارو دز ئەچوو.

گەنج٢: تۆ پێت وایە چی بوون؟

گەنج١: منیش لە تۆ ئەپرسم، چی بوون؟ بەڵام بەوپێیەی دانەبەزین، کەواتە بۆ ماڵان نەهاتبوون، ڕەنگە بۆ چاودێریی ئێمە هاتبن.

گەنج٢: ئەی بۆ ڕۆشتن؟

گەنج١: دەی یان چوون چەک بێنن و ئیتر خۆت ئەزانی ئەوسا چی ڕووئەدا.. یان چوون پۆلیسمان بۆ بێنن، یان چوون ڕێڕەوی گەڕانەوەی ئەو بگۆڕن.

گەنج٢: ئەی کەواتە چی بکەین؟

گەنج١: دەی بەسەری برایەتیمان من وای بۆ ئەچم، لە هەر سێ بارەکەدا، من و تۆ تیاچووین.

گەنج٢: ئەی چی بکەین؟ دە خێرا پێم بڵێ.

گەنج١: ئیش بە سەرەڕۆیی ناکرێ برا، ئەگەڕێینەوەو پێی ئەڵێین حاڵ لەمەو مەسەلە لەوە.. خۆمان بۆ بە گورگان خواردوو بدەین.

گەنج٢: نەوەڵا ئەوە ناهێنێ.. با بڕۆین.

گەنج١: دەرچۆ برا دەرچۆ!

Cut

دیمەنی – ١٦٧٨ – ڕ/ن – چاپخانەی تیرۆژ:

(( باهۆز هەندێ پەڕەی کتێبی پێیە دەرزی لێ نەدراوە، فەلە.. تیرۆژ تەماشای ئەکا ))

تیرۆژ: ها چییە دەنگت برا؟

باهۆز: بە ڕاستیی ئیشێکی پاکە، ئەی بەرگەکە ئەتوانم ببینم؟

تیرۆژ: ئەو هەموو پەلەیەت لە چییە کاکە، هەر هەمووی ئاوا دێتە بەردەستت، من پێموتی سێ ڕۆژیتر، بەوجۆرە چوار ڕۆژیتر ئەتوانی بیبەیتە کتێبخانەکان، ئەوسا نەک هەر خۆت، خەڵکیش ئەیبینێ.

باهۆز: ڕاستە، بەڵام ئیتر ئەمە خەونی ژیانمە، لەو بڕوایەدام یەکەم کتێب زۆر شیرین بێ.

تیرۆژ: من باوەڕ ناکەم وابێ.

باهۆز: چۆن؟

تیرۆژ: پێش تۆ کەسێک کتێبێکی بۆ هێناین، لێم پرسی وتی هەشتەمین کتێبمە، ئەویش وەک تۆ هەر پەلەی بوو.. دیارە ئەم نوسەرو شاعیرانە هەروا پەلەیانە؟ هههە.

باهۆز: تۆ ڕاست ئەکەی.. بەڵام من کتێبی دووەمیشم هەر ئەهێنم بۆ ئێرەو بەڵێنیشت ئەدەمێ هیچ پەلە نەکەم.

تیرۆژ: وەرە تەماشای بەرگەکەشیکە.

(( باهۆز هەڵئەسێ بۆ تەماشا کردنی کۆمپیوتەرەکەی تیرۆژ))

Cut

دیمەنی – ١٦٧٩ – ڕ – ئێوارە/ د – چایخانەکە:

(( هاوڕێ خەریکی شتنی بەردەمی ئۆفیسەکەو چایخانەکەیەتی.. هەندرێن دێتە لایەوە))

هەندرێن: هیچ دەنگوباسی تازە نەبوو مامە هاوڕێ؟

هاوڕێ: کورە نەبەخوا، هەر خوا بکا هیچی لێ نەکەن تا کاک حمەخدر ئەیگاتی باشە.

هەندرێن: هەر خوا ڕەحمی پێ بکا.

هاوڕێ(( بەدەم گسکدانەوە)): ئامین!!

هەندرێن: دەی دەستوبردێ بکە، با پێکەوە بڕۆین بۆ پاسەکان.

هاوڕێ: نا تۆ بڕۆ کەسەکەم، من زۆرم ماوە.

هەندرێن: ڕۆژەکەی زۆر خۆش نییە بە تەنیا جێتهێڵم، دەی خێراکە.

هاوڕێ: دەی سا وەڵا هەزارجار..ماڵیشت ئاوا بێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٨٠ – ڕ – ئێوارە/ن – ماڵی شەنیا- شار:

(( شەنیاو سەرچڵ و گوڵزار))

شەنیا: ئا لاوێنم ناردەوە بۆ کونەگورگەکە، ئەی بە ئارینام وت نان نەدا بەو چەتیوە ڕشکنەی خوشکی خدر، تا خۆمان ئەگەڕێینەوە.

گوڵزار: ئەی بۆ ئەو نەخەینە بری نارەوەن؟ لەبەردەستایەو هیچ ئاڵۆزیەکیشی تیا نییە هههە.

شەنیا: نا گوڵی گیان ئەوە نابێ، ئەگەر بۆ سوعبەتیش بیڵێی.. ئەو بارمتەی کاری قورسترە، بەڵام نارەوەن سوێ کردنە بە دڵی کەسێکیترا، بە کورتی هەوەسێکەو هیچیتر، کێشە نییە کە هاتنەوە، ئەتاننێرم بۆ خوشکە بچوکەکەی ئامۆ.. هەر کەسیش ئاگای لێ نییە.. خۆ مەرج نییە هەر دایکی بێ.

سەرچڵ: باشە تۆ بۆ وا گەرت لە ئامۆ ئالاندووەو هیچیش دەربارەی ساماڵ ناڵێی؟ خۆ ئەو ناپاکییەی ساماڵ لەگەڵی کردووی، کوا ئامۆی داماو چی کردووە؟

شەنیا: سەرچڵ گیان جیاوازیی زۆرە، من ساماڵم بەکارئەهێناو ئەویش بەکاری ئەهێنام، هەر ئەبووایە یەکێکمان بیبەینەوە، ئەوە بوو ئەو براوە دەرچوو، هەرگیز ساماڵم خۆشنەویستووە.. بەڵام بە هەموو ژیانم یەک کەسم خۆشویست، ئەویش ئامۆ بوو، تا سەرئێسقان دڵی شکاندم، بۆیە بڕیارم وایە تا بمێنم سوێ بکەم بە دڵیا.. جارێ لە کوێیەتی؟

سەرچڵ: ئاخر ئەوەش ناکرێ شەنیا گیان بۆ هەوەسی خۆت ئەمڕۆ ژیانی سێ کەست خستە مەترسییەوە.. ئەکرێ کاتی زیاتری بدەیتێ، ئەم هەموو پەلەپەلەت لەچی بوو؟ خۆ ڕاناکا؟

شەنیا: قسەکەت تەواوە، بۆ خوشکە بچوکەکەی کەستان ناخەمە مەترسییەوە خۆم ئەوە ئەکەم، نەک هەر ئەو، بەرنامە بۆ هەرکەسێکیتریشیان دابنێم، هەر خۆم ئەیکەم.. قسەکەت زۆر تەواوە ئەوە پەیوەندیی بە کاری گروپەکەوە نییە.

سەرچڵ: ببورە، مەبەستم ئەوە نییە نیگەران بیت.. من سەریشم هی خۆتەو لە پێناوتا دایئەنێم، تەنها مەبەستم پەلەپەلی ئەم عەسرەت بوو.

شەنیا: ئەوە بەڕاستتە سەرچڵ گیان؟ لە تۆ نیگەران بم؟ قەت ئەوە من نیم.. من چاکەی تۆ مەگەر بە ژیانم بدەمەوە.. بەڵام ڕاستیی ناشارڕێتەوەو با ئەو کچانەش بەهۆی هەوەسی منەوە توشی بەڵایەک نەبن.. ئەو کارانە خۆم ئەیکەم.. ئێستا گرنگ بەرنامەی بەیانییە.

سەرچڵ: من لە خزمەتتام.

گوڵزار(( ئانیشکی ئەخاتە سەرشانی سەرچڵ)): سبەی سەرچڵ گیان هەموومان ئەبا بۆ ئەو دنیایەی بۆنی خۆش و پارەی لێهەڵڕژاوە.. وا ئەکەین بۆ نیوەڕۆ دڵت بگەشێنینەوە.

شەنیا: ئەو دووەتان و تافان و لاوێن ئەچن، وایە؟

سەرچڵ: بەڵێ من بەیانی زووەکەی دێم لێرە گوڵزارو لاوێن هەڵئەگرم و ئەچین بەدوای تافانا.

Cut

دیمەنی – ١٦٨١ – ش/ن – نادی:

(( ڕەوەزو زاهید ))

زاهید: تەلەفونەکەت نەکرد بۆ دیدەوان؟

ڕەوەز: کورە ئەوە کەی پیاوە تەلەفونی بۆ بکەم؟ هەرکاتێ خۆی کردی، پێی ئەڵێم هەر لە هەولام.

زاهید: خۆ لە پارەی شتەکانیش ناپرسێتەوە!

ڕەوەز: پارەی حەرامە بۆیە ناپرسێتەوە. هههەه.

زاهید: نەوەڵا خۆی گرتووە بزانێ بە نیازی چیت.

ڕەوەز: قەت ئەوە من نییم پارەیەکم بێتە بەردەست و لێی کەل نەکەم هههە، با بەیانی لەسەر خێر ئێوە بگەڕێنەوەو بیفرۆشین بە کڕیارەکان، ئەوسا بەشێکی باشی بۆ خۆمان هەڵئەگرین و ئەویتری بۆ ئەبەینەوە.

زاهید: تەبعەن داوای کرێی ئیشەکەش ئەکەی!

ڕەوەز: لەوەیانا داوای کرێ بۆ ئێوە ئەکەم، خۆم چارەکی خێرەکەم بەرئەکەوێ.

زاهید: بەخوا وابزانم لە برابەش زیاتری ئەبەی؟!

ڕەوەز: نا مەکە ساغ و پاکی ئەدەمێ وانا؟ هههههە.

Cut

دیمەنی – ١٦٨٢ – ش / ن – ماڵی نارەوەن:

(( خدرو تریفەو نارەوەن و تیرۆژو ئامۆ))

ئامۆ: لە بەیانییەوە دایکم و تریفەو تیرۆژ ناچنە دەرەوە، تا شتێ ڕوون ئەبیتەوە.

خدر: منیش ئەو ڕایە پەسەند ئەکەم، بە ڕاستی ئەبێ یا نەچنە دەرەوە، یان چواردەوریان بە پاسەوان بگیرێ.

نارەوەن: ئەی بۆ لە ماڵەوە کۆت و زنجیریشمان ناکەن؟

ئامۆ: ئەگەر بزانم سەلامەتتر ئەبن، هیچ لاریم نییە ئەوەش ئەکەم.

تیرۆژ: منیش ئەو پێ باشە، بۆ لە خۆڕایی تیابچین.. ئەوەتا کەس نازانێ دایکم چۆن لەو سێ سەیارەیە دەربازی بووە.

تریفە: تۆ کێ پێی وتی سێ سەیارە بۆی دانیشتوون؟

خدر: برادەرێکم لەگەڵ سەیارەیەکیانا بووەو دوانەکەیتریشی بینیووە.

نارەوەن: وەی دایکی بمرێ، خۆ خوانەخواست هەرچی ڕووی بدایە ئاواو نینای داماویش توشی بەڵایەک ئەبوون.. کاکە من ڕازیم، هەر ناچمە دەرەوە، با کەس بەهۆی منەوە گرفتار نەبێ.

تریفە: باش!! ناچین، خۆتان ئۆفیسەکەش بەڕێوەبەرن.

ئامۆ: چاوی ئۆفیسیش دەرئەهات، بزانم ئەبێتە مایەی زیان پێگەیاندنی ئێوە، هەر دائیەخەم.. تۆ وتت چی کاک حمەخدر؟

خدر: بە دڵنیاییەوە.. بەڵام ڕەنگە ئەو کەسانە بدۆزرێنەوەو ئیتر هیچ کێشەیەکمان نەمێنێ.

ئامۆ: تا ئەوانە ئەدۆزرێنەوە، با جارێ وابێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٨٣ – ش/ن – ماڵی دیدەوان:

(( دیدەوان و ساماڵ و سەرخێڵ))

دیدەوان: پێم خۆشە بەیانی یەکێکتان لەگەڵ ئەو دوو هەتیوەیا بچن.. ئەترسم ئیشەکەی بەیانیش وەک کوشتنەکەی نارەوەن لێ بکەن و بە دەستی بەتاڵ بێنەوە.

ساماڵ: جا ئەمرت بە چییە گەورەم، وا ئەکەین.

سەرخێڵ: منیش ئامادەم.

دیدەوان: لێتان ڕائەبینم، با ساماڵ لای من بمێنێتەوەو بەیانی کە هاتنە بەردەرگا، سەرخێل گیان تۆش لەگەڵیانا سەرکەوە.

سەرخێڵ: وەی بەسەر هەردوو چاوم.. هەر باشتریشە، با چاوم بکرێتەوە بۆ ئەو ئیشە.

دیدەوان: ئەی چۆن؟ ئەزمونێکی زۆر باش ئەبێ بۆ تۆ.

ساماڵ: جا گەورەم کوشتنی ئەو ژنەشت بە ئێمە بسپاردایە، ئێستا لە گۆڕا ئەبوو.

دیدەوان: من چۆن دڵم دێت ئێوە بخەمە بەر مەترسیی.. ئەو ئیشانە بە خەڵک ئەکەین ڕۆڵە، خۆمان نابێ دڵمان بە هیچ شتێک داخورپێ.. من ئێستاش کە ئەتبینم ئاگر لە جەرگم بەر ئەبێ بۆ ئەو شەوەی تەقەکانتان لێکرا.. هەرگیز لەوە خۆش نابم دڵنیابە.. تۆڵەت هەر ئەکەمەوە.

ساماڵ: سوپاسی لوتف و گەورەییت ئەکەم قوربان، توخوا هیچ گوێی مەدەرێ، بەخوا من هەر بیریشم چۆتەوە.

سەرخێڵ: کەواتە ئەو چوونەی بەیانی من هیچ مەترسیی تیا نییە.

دیدەوان: نەخێر، خۆم ئەزانم چۆنت دوور ئەخەمەوە لە هەموو جۆرە مەترسییەک.. ئێوە دوو گوڵەکەی خۆم و ئایندەی گروپەکەن.. تەنها ئەوەندە دڵنیابە کە شتەکە وەرئەگرن و هیچیترم ناوێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٨٤ – ش – دەمەو بەیان/ ن –ماڵێک:

(( خدرو تافان و هەندرێن و هاوکارو عەبەو سەفین و نەقیب ڕاهۆزو دو ئاسایش هەن))

خدر: خەمی ماڵی باوکت و مناڵەکانت نەبێ بیبڕەوە.. دڵەو ئەحە بردنیان بۆ ماڵی خۆیان، زۆر ئەمینە.

تافان: ئەی تۆ نەتوت تۆ لەگەڵ گروپەکەی شەنیایا بڕۆ؟

ڕاهۆز: شەوێ بەرنامەمان گۆڕی خوشکەکەم.. ئێمە (( سەیری خدر ئەکا)) بە ئیزنی گەورەم دەست بەسەر ئەم گروپەدا ئەگرین و خۆمان ڕێکمانخستووە چۆن ئەیاننێرین بۆ سەر سنور.. ئەوەی لەسەر تۆیە، دوای ئەمەی ئێرە، ئەچیتەوە ماڵەکەی خۆت و سەعات شەش لەگەڵ ڕەوەزو ئەواندا ئەڕۆی، وەک هیچ نەبووبێ.

تافان: ئەی توشی هیچ نابم؟ چۆن بگەمەوە ماڵی خۆمان؟

خدر: سەفین بە سەیارەیەک تۆو هەندرێن ئەباتەوە.. دە بەسیەتی، تۆ چۆن لە ئیشی حوکمەت ئەترسی؟

هەندرێن: یەک دەقەی ماوە بۆ پێنج ڕەنگە ئیتر پەیا بن.

خدر(( سەیری سەعات ئەکا)): وایە ئیتر بێدەنگ بن.

(( لە چاوەڕوانیدا بێدەنگ ئەوەستن و پاش کەمێک لە دەرگا ئەدرێ و گوڵزار بە دەنگێکی نزم بانگی تافان ئەکا، نقیب ڕاهۆز لە پڕا دەرگا ئەکاتەوەو باڵی گوڵزار ئەگرێ و فڕێی ئەداتە ژوورەوە.. خدرو عەبەو سەفین و هاوکار کە چەکیان پێیە.. زۆر بە پەلە ڕائەکەنە دەرەوە.. دوو ئاسایشەکە گوڵزار ئەگرن و نقیب ڕاهۆزیش ڕائەکا بۆ دەرەوە))

Cut ———— تابع

دیمەنی – ١٦٨٥ متبوع – ش – دەمەو بەیان/ د – بەردەرگای ماڵێک:

(( کۆمەڵێک ئاسایش بە چەکەوە دێن و خدرو عەبەو سەفین و دواتر نقیب ڕاهۆز دێنە دەرەوەو چەک ئاراستەی سەرچڵ و لاوێن ئەکەن و لەسەیارەکە دایانئەگرن.. دواتریش دوو ئاسایشەکە گوڵزار ئەهێنن.. سەرەتا چەکیان ئەکەن، کە هەریەکەو دەمانچەیەکی پێیە))

خدر(( تورە)): مۆبایلەکانتان (( بۆ لاوێن)) ئەمە تۆی جەربەزە؟!!! (( هەرسێکیان مۆبایلی ئەدەنێ و خدر ئەیخاتە عەلاگەیەکەوەو تافان بانگ ئەکاو لەگەڵ هەندرێنا دێنە دەرەوە)) ئا وەرە ئەم دوو چەتیوە بپشکنە، هەرچییان پێیە بیخەرە ئەو عەلاگەیەوە.

تافان: بەسەرچاو.. (( پشکنین و دەرهێنانی مۆبایلێکیتر بە گوڵزارو ئەیخاتە عەلاگەکەوە.. پۆلیسێکیش سەرچڵ ئەپشکنێ)) هەر ئەوە بوو گەورەم.

سەرچڵ(( استهزاء)): حمە خدری حەماڵ بوو بە گەورەم؟

ڕاهۆز(( زللەیەکی لێ ئەدا)): بێدەنگ!

خدر: شەنیا لە کوێیە؟.. بەم بەیانییە زووە یاسا بەخەبەر نییە با بزانن، بیللاهی وەک سەگ هەرسێکتان ئەتۆپێنم.

سەرچڵ: من جێی نازانم.

خدر(( میلی دەمانچەکەی ڕائەکێشێ، بۆ سەری سەرچڵ)): خۆت مەکە بە یەکەم قوربانیی بۆ شەنیا، پێم بڵێ.

سەرچڵ: باوەڕکە من تەنها بەڕۆژ ئەیبینم لە ماڵێکا ئەتوانم بتبەمە سەر ئەو ماڵە.. بەشەو لەگەڵ گوڵزارو لاوێنا ئەچن بۆ کونە گورگ.. نازانم ئەو کونەگورگە لەکوێیە، بە منیان نەوتووە.

خدر: دەک عەمرت نەمێنێ، متمانەشت پێ ناکەن و وەک سەگیش دوایانکەوتووی؟

گوڵزار: منیش نازانم لە کوێیە.

لاوێن(( بەتەحەداوە)): منیش نازانم.

خدر(( دەمانچەکە ئەخاتە سەر سەری لاوێن)): خۆم هەر زۆر ڕقم لەم سەگسارەیە، لەدەستم ڕایکرد، (( بۆ لاوێن)) با تۆ لەکۆڵکەمەوە جارێ نەک دووبارە ڕاکەیت.. هەرمێی خوشکم لە کوێیە؟ بەس بڵێی نازانم ئەیتەقێنم.

لاوێن: لای شەنیا خانە لە کونەگورگ.

خدر: ئەو کونەگورگە لە کوێیە؟ بە نازانم وەڵامم نەدەیتەوە ئەوە پێم وتی.

لاوێن: لە دەرەوەی شارە.

گوڵزار(( تورەو قیژە)): لاوین نەیڵێی!

خدر(( بە پشتە دەستی ئەکێشێ بە ناوچەوانی گوڵزارداو ئەکەوێ)): فزەت لێوە نەیەت چەتیو.. بمانبە سەر کونە گورگ.

سەرچڵ: ئەگەر ئێوە پیاوی یاسان، لێدان قەدەغەیە لە یاسادا.

خدر: وەک پێموتی خوێڕی پیاوکوژ.. یاسا هێشتا خەبەری نەبۆتەوە، گەر ڕاستیم پێ نەڵێن، ناگەنە بەردەمی یاسا.

سەفین: گەورەم من تافان خان و کاک هەندرێن ببەم؟

خدر: ناو سەیارەکەیان باش بگەڕێن و تۆ بڕۆ (( سەفین و ئاسایشێک ئەگەڕێن))

لاوێن: ئەگەر بتانبەمە سەر کونەگورگ، نامانکوژیت؟

خدر: بەڵێن بێ نا.

لاوێن: ئەی چیمان لێ ئەکەی؟

خدر: ئەچنە بەردەمی دادگاو پیاوکوژ بە ڕێی خۆی و بێتاوانیش بە ڕێی خۆی.. وابزانم تۆش شتێکی بچووکت بەرئەکەوێ.

سەفین: گەورەم ئەم کیسە دۆلارەی تیابوو.

خدر: نەقیب ڕاهۆز لێی وەرگرە.

(( دوو سەیارەی ئاسایش دێن و خدر لاوێن ئەخاتە پێشی یەکێکیانەوەو خۆی لەگەڵیا سەرئەکەوێ و عەبەو هاوکارو چەند ئاسایشێکیتر ئەچنە دواوە ))

ڕاهۆز: گەورەم ئێوە پێشکەون ئێمەش لە دواتانەوەین.(( ڕاهۆز سەرچڵ و گوڵزار ئەخاتە دواوەی پیکابەکەی خۆی))

(( سەیارەکان دەرئەچن))

سەفین(( بۆ هەندرێن)): لێرە بوەستن، ئەچم سەیارەکە ئەهێنم لەو کۆڵانەی ئەودیوە.

(( سەفین ئەچێ بۆ سەیارەکە))

Cut

دیمەنی – ١٦٨٦ – ش – دەمەو بەیان/ د – بەرماڵی دیدەوان:

(( دیدەوان و سەرخێڵ و ساماڵ و دوو گەنجەکە))

دیدەوان: ئا ڕۆڵە، ئەم کوڕە قۆزەش لەگەڵتانا دێت، لەوسەرەوە سەیارەکەی پیا بنێرنەوە.. خۆ ئێوە هەر بە شاخ و داخا دێنەوە.

گەنج١: بەڵێ ئەرەوەڵا وا خۆمان پێچاوەتەوە، زریان و تۆفانیش بێ، خەممان نییە.

گەنج٢: موقەدەر نەبێ بە دوو تا سێ ڕۆژ ئەگەینەوە ئێرە.

دیدەوان: دەی بە قوربانی کوڕ بم.. شێری وەک ئێوەم هەبێ باکم نییە.

گەنج١: فەرموو کاکە.. دەی بە ئیزنی ئێوە.

(( خواحافیزیی و چوونەوە ژوورەوەی ساماڵ و دیدەوان))

Cut

دیمەنی – ١٦٨٧ – ش – دەمەوبەیان/ د – بەردەرگایەک:

(( ڕەوەزو زاهیدو دلێرو ڕێبین))

ڕەوەز: ئەوە زاهید لەگەڵتانا دێت، ئەو دوو کچە هەڵگرن و ئیتر خۆی دێتەوە بۆ لای من.

دلێر: ئەی گەورەم خۆ ئێمە شارەزا نیین بڕیار نەبوو کاکە زاهیدیش بێت؟

زاهید: کاکە با نەترشێ، کێشە نییە.. ئەمجارە ئەچم و ئیتر خۆیان ماڵیی ئەبن.

ڕەوەز: دەی پێنج کەس زۆرە، هەر ئەو دوو کچە بەرەو تەواو.

زاهید (( سەری دلێر ئەگرێ)): نا نا ئەم سەرخڕەش ئەبەم، هەر یەکجاری بەسە.

دلێر: من زۆر حەز ئەکەم شارەزای ئیشەکە بم، ئیتر هەر خۆم ژنەکان ئەبەم.

ڕەوەز: دەی کەواتە بڕۆن چاوەڕێی چیین؟

زاهید: ئەی نابێ ڕێبوار بێت بە ملی شکاوی؟ هەر ئەو ماڵی سوعادەکە ئەزانێ.

ڕەوەز: ئای قوڕ بەسەر ئەوەی چاوەڕوانی ڕێبوارە ئیشی بۆ بکا.. بڕۆن و هەر تافان بەرن.. واز لەویتر بێنن.. (( بۆ ڕێبین)) ئەمەش با لای من بێ.

Cut

دیمەنی – ١٦٨٨ – تازەگزنگ / د – نزیکی ڤێللاکەی شەنیا:

Mute

(( دوو سەیارەکەی ئاسایش بەرودوا دێن و لە نزیکی ڤێللاکەی شەنیاوە ئەوەستن.. خدر هێزەکە دابەش ئەکات بە چواردەوری ڤێللاکەدا، لاوێن هەندێک قسە لەگەڵ خدر ئەکات و خدر پێشی خۆی ئەدات..

# (( ئەڵقەی هەشتا ))

لاوێن دەرگای سەرەکی ئەکاتەوەو دواتر ئەچێت لە ژێر بەردێکا لە باخەکەدا کلیلێک دەرئەهێنێت و دەرگای سەرەکی ڤێللاکە ئەکاتەوە، خدر لاوێن ئەداتە دەستی هاوکارەوە.. خۆی و ڕاهۆزو چەند ئاسایشێک و عەبە ئەچنە ژوورەوە))

Cut ــــــــــــــــ تابع

دیمەنی – ١٦٨٩ متبوع – ڕ- خۆر دەرکەوتووە/ن – ڤێللای شەنیا:

(( خدرو ڕاهۆزو ئەوانیتر ئەگەنە سەر شەنیا نوستووە.. خدر بە لوولەی دەمانچەکەی بە ئاگای ئەهێنێتەوە، شەنیا چاو ئەکاتەوەو ئەیانبینێ بە پەلە دەست ئەبا بۆ ژێر سەرینەکەی، خدر دەستی ئەگرێت))

خدر: هیچ سوودی نییە، هەموو شتێ تەواو بووە خەوخۆش.. کوا هەرمێلەی خوشکم؟

شەنیا: بەیانیت باش کاک حەمەخدر.

خدر: کاتی پێچە بە دەورەت نەماوە، هەرمێلە لە کوێیە؟

شەنیا: لە شوێنێکی ئەمینە خەمت نەبێ.. دەستێکی ئەمینیش خزمەتی ئەکا.

خدر: لە چ ژوورێک بەندت کردووە؟

شەنیا: ڕاستییەکەی لەو ژوورەی تەنیشتم بوو.. بەڵام شەوێ بردیان بۆ شوێنێکیتر.

خدر(( دەمانچەکە ئەخاتە سەرسەری)): پێم ئەڵێی یان مێشکت هەڵگرم؟

شەنیا(( بێباک)): ئەگەر مێشکم هەڵگری وەکو ئەوە وایە مێشکی هەرمێلەی خوشکت هەڵگرتبێ، چونکە ئیتر کەس ناتوانێ پێت بڵێ لە کوێیە.

خدر: ئەو ژوورانە بگەڕێن.

شەنیا: بێسوودە.

(( پۆلیس بە پەلە ئەچنە دەرەوە هەر ڕاهۆزو خدرو عەبە ئەمێننەوە))

خدر: هەوڵی نەزۆک مەدە شەنیا، دۆسیەکەت پڕە، با لێرە نەکوژرێی.

شەنیا(( پێکەنین)): من باکم نییە لە هەر شوێنێکا بکوژرێم.. (( دەنگی تەقە دێت، دوو سێ فیشەک)) ڕەنگە ئەو تەقانە لە هەرمێلە گیان کرابێ. (( خدر زللەیەکی لێ ئەدا.. شەنیا قاچی لە دەرەوەی بەتانییەکەیە، شەقێک لەو دەستەی خدر ئەدا کە دەمانچەکەی گرتووە، دەمانچەی خدر ئەپەڕێت، شەنیا پەلاماری ژێر سەرینەکەی

ئەدات و دەمانچەیەک دەرئەکەوێ، خدر پەلاماری ئەدات و دەمانچەکەی لەدەست وەرئەگرێت.))

خدر: وتم هەوڵی هیچ مەدە.

شەنیا: جا ئەوە کەی هەوڵ بوو خدر گیان.. هەوڵ لە دووابیا ئەبینی، کە پێستی هەرمێلەکەت ئەگرووم.

خدر: نەقیب ڕاهۆز کەللەپچەی کەن و بیخەنە دواوە.

ڕاهۆز: فەرمانتە گەورەم.(( کەللەپچەی ئەکا ))

شەنیا: ئۆو ساختەچی ئەوە شتیش بووی نەمانزانی بوو؟

(( دوای کەللەپچە کردنی، عەبە بە قژ ڕاکێشان ئەیباتە دەرەوە، خدرو ڕاهۆز بە پەلە بەپیر تەقەکانەوە ئەچن))

تابع —— Cut

دیمەنی – ١٦٩٠ – متبوع – ڕ/ن – ژوورێک لە قاتی دوو، یان لە پشتەوە:

(( خدرو ڕاهۆزو عەبە لەو ژوورە دێنە دەرەوەو ئاسایشێک ئامارژەی ئەو ژوورەی بۆ ئەکا.. خدر ئەگاتە بەردەمی ئەو ژوورەو ئارینا بە جلی ماڵەوە ئەبینێ باڵی برینداەرەو دەستی پێوە گرتووە.. ئاسایشێکیش قاچی بریندارە))

ئاسایش: گەورەم تەقەی لێکردین، من تەنها ئەو دەستەیم پێکا کە دەمانچەکەی پێ بوو.

خدر: هەر زۆر دەستت خۆش بێ (( ئەچێتە بەردەمی ئارینا)) ئەبووایە بینایە بە تەپڵی سەرتەوە.. تەقە لە پیاوی میری ئەکەی بێ ئابڕوو؟ کوا هەرمێلە لە چ ژوورێکە؟ (( ئارینا بێدەنگەو خدر دەست لە برینەکەی نزیک ئەکاتەوە)) دەست ئەخەمە ناو برینەکەتەوە، تا پێم نەڵێی لە کوێیە دەستی لێ هەڵناپڕم، پێش ئەوەی ئازارت بدەم قسە بکە.

ئارینا: لە ژووری پشتەوەیە.. کلیلەکەی لە گیرفانی ئەو پانتۆڵە ڕەشەمایە کە هەڵواسراوە.

خدر(( پێشی خۆی ئەدا)): وەرە دەریکە.

(( ئارینا ئەچێ لە پانتۆڵەکەیا کلیلەکە دەرئەکات و ئەیداتێ.. خدر بە پەلە ڕائەکا بۆ دەرەوەو عەبە بەدوایا))

تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ١٦٩١ – متبوع – ڕ/ د – ڕاڕەوێکی دەرەوەی ڤێللاکە:

(( خدر ڕائەکات و عەبە بەدوایەوە))

عەبە(( هەناسەبڕکێ)): گەورەم تۆ خۆت عەزێت مەدە ئەچم بۆت ئەهێنم.

(( بە ڕاکردن تا بادانەوە بۆ لای دەرگای ژوورەکەو گەیشتنی خدر بە دەرگایەک و کردنەوەی))

خدر: هەرمێلە گیان!!!

ـــــــــ تابع ـــــــــ Cut ـــــــــ

دیمەنی – ١٦٩٢ – متبوع – ڕ/ن – ناو ژووری سجنی هەرمێ:

(( هەرمێ بە ڕاکردن دێت و سەرئەنێ بەسنگی خدرەوە ))

هەرمێ: قوربانت کاکە پۆلا گیان، هەر ئەمزانی ئەمگەیتێ.

خدر: کچێ خۆم قوربانت هەرمێلە گیان، چۆن جێت ئەهێلم؟ بەساقەوبم دایکەکەی دایکم.. وەزعت چۆنە؟ ئازاریان نەداوی؟

هەرمێ: نا نا زۆر باشم، هەر دلم لای ئێوە بوو و هیچیتر.

خدر: با تەلەفونیش بۆ باوەو مالی خەزوریشم بکەم.

هەرمێ: بۆ بە دزیی ئێمەوە ژنیشت هێناوە؟ شەرتبێ بەسەرتەوە نەچێ. هەهە.

خدر: بەسەرمەوە ناچێ چی ئەکەی هەرمێلە گیان؟ خۆ شوویەکیتر ناکەیت و پێم نەلێیی؟ هههە.

(( خدر تێل ئەکا ))

Cut

دیمەنی – ١٦٩٣ – ڕ/ د – بەرماڵی هەندرێن:

(( تافان دیتە دەرەوە، ناو سەیارەکە زاهیدو دلێری تیایە))

تافان: ئەی کوا کاک ڕێبوارو ئەو ژنەیتر؟

زاهید: تۆ سەرکەوە.

تافان: ئاخر دێن یان نا؟

زاهید: ئەوانمان پێویست نەبوو، کاک ڕەوەز وتی لەسەر بەڵێنەکەی هەر تافان با بێت.

تافان(( بێزار)): ئای خوایە!

زاهید: سەرکەوە دادەگیان، کاتمان بەبەرەوە نییە، زۆر درەنگە.

(( تافان سەرئەکەوێت و دەرئەچن))

Cut

دیمەنی – ١٦٩٤ – ڕ / د – ناو سەیارەی دوو گەنجەکە:

(( سەرخێڵ لە دواوە دانیشتووەو بە مۆبایل نامە ئەنوسێ))

گەنج١: ئیتر ئەم عەشقە ماڵی بەقوڕگیرێ ئاوایە، لەوەتای ڕۆژ بۆتەوە تۆ خەریکی نامە ناردنی هههە.. ئەترسم وەڵامیشت نەداتەوە، گوێم لە دنگەی وەڵام نییە.

سەرخێڵ: ئەوە شیعری بۆ ئەنوسم، قەینا وەڵامی ناوێ.

گەنج١: ئای دنیا بۆ کوێر نابیتەوە؟ ئەترسم کاک دیدەوانیش دڵی بە تۆ خۆش بێ، کارو کاسبی بۆ بکەی هههە.

گەنج٢: ئای طرحێووووو!

سەرخێڵ: برا طرحێو بۆ ئەکەی؟ من بە هەمووی سەعاتێک ئەبێ و نابێ ئێوە ئەناسم.. وا خۆشترە ڕێزی یەکتر بگرین.

گەنج١: جا بۆ ئەوەی من ڕێزت زۆر بگرم، ناوت ئەنێم کاک ڕێز.. ئەوە باشە؟

سەرخێڵ: بەڵام هەر ئەمجارە یەکتر ئەبینینەوە، کە ڕۆشتینەوە بە کاک دیدەوان ئەڵێم ئیتر من لەگەڵ ئەو دووانەیا سەفەر ناکەم.

گەنج٢: کاک تەڕەماش کێیە؟ ئێمە ئیش ئەکەین ئیش، هەر ڕۆژەو بلۆف لە یەکێک ئەدەین.. وەک تۆ نابینە پیاوی کەس تێگەیشتی؟ بۆ نموونە هەر زۆر قسەی زیاد بکەی، لێرە فڕێت ئەدەمە خوارەوە.

سەرخێڵ: ببورن.. دیارە هەڵەیەکم کردووە.. ئێوە برا گەورەن.

گەنج٢: تۆ مادام قبوڵت کردووە پیاوی دیدەوان بیت، هەموو کەسێ برا گەورەتە.. تۆ زەلیلی لەبەردەم ئەو کابرایەدا. تێگەیشتی

سەرخێڵ: بژێوییە چی بکەم؟

گەنج٢: ئەتوانی وەک ئێمە ئازاد بیت و بە پارە ئیش بکەیت.. نەک زەلیلی یەک کەس بیت.. بەوە لە پیاوەتی دائەماڵرێی نەگبەت.

سەرخێڵ: قسەی جەنابتانە.. ئێوە وەرم ئەگرن لای خۆتان، من بێمە لای ئێوە؟

گەنج۱: تۆ هەر بە زەلیلی ڕاهاتووی.. بۆ ئەپاڕێیتەوە ئێمە وەرتبگرین؟.. خۆت پیاو بەو سەربەخۆت بە، نەک ئەم و ئەو.

سەرخێڵ: پێویستە بیری لێ بکەمەوە، ئێوە ڕاست ئەکەن.. با ئەم سەفەرە تەواوکەین.

گەنج۱: بەڵام پیاوبە پیاو، نەک گەڕایتەوە لای دیدەوان بیرت بچێتەوە.

سەرخێڵ: دڵنیابە هەرگیز بیرم ناچێتەوە، وانەکەتان بۆ من زۆر کاریگەر بوو.

گەنج۲: ئاوا ئاقڵبە، گوێ لە گەورەی خۆت بگرە هەتیو!

Cut

دیمەنی – ١٦٩٥ – ڕ/ن – ماڵی نارەوەن:

(( تیرۆژ و ئامۆو نارەوەن و تریفە بە جلی ماڵەوە دانیشتوون، نانی بەیانی ئەخۆن. ئاواو نیناش دێن، دوای بەیانی باش))

ئاوا: ئای دەمێکە بیری ئەم خواردنەت ئەکەم نارەخان.

نینا: وتی با نانەکە لەوێ بخۆین، ئێستا سفرەکەی دایکم ڕازاوەیە.

نارەوەن: جا قسەتان بکردایە زوو هەڵئەسام و ئەمانکرد بە جەژن.

تیرۆژ: کاکە ئۆفیسەکەم ئەکەیتەوە؟

ئامۆ: نا هەر ئەچم بە کرێکارەکان ئەڵێم ئیشی خۆیان بکەن و ئیشیتریش بوو خۆیان وەریگرن.

تیرۆژ: با کلیلەکانت بدەمێ ئەو کاک بەهمەنەی لێیە، ئەو ئۆفیس بکاتەوە.

ئاوا: ئەی خۆت بۆ ناچی خانباجی؟

ئامۆ: بە قسەی من ئەکەی ئاوا گیان، با نیناش ئەمڕۆ لە ئیش دوورکەوێتەوە، خۆ تۆ بەردەوام بە دوایەوە نییت؟ وا حمە خدر ئەڵێ نەک هەر خوشکەکەی ڕزگار کردووە، زۆریشیان لێگرتوون.

ئاوا: واو.. چەند باشە (( بۆ تریفە)) بەخوا ئەو هەتیوەی مێردت شتێک دەرئەچێ؟ هەهە بشزانە!!

نینا: هەر ئەمڕۆ بێ باشە، بەخوا دەرەوە زۆر مەترسیدارە، ئەڵێی هەرچی جڕوجانەوەر هەیە چاویان پێمانا هەڵناوە.

ئاوا: تریفەو دایکیشم ناچن؟

ئامۆ: تا حمە خدر دێتەوە، هیچیان ناچنە دەرەوە، با نیناش نەچێ ئاوا گیان.

ئاوا: ئای کە پێم خۆشە.. (( بۆ نینا بە سوعبەتەوە)) کچێ دانیشە لێرەو بە هیچ لایەکا نەچی، گوێت لە کاکمان بوو چی وت؟

نینا(( سوعبەت)): منیش زۆرم پێخۆشە، بەڵام چاوباشقاڵیی نەکەی. ها! (( پێکەنین))

تریفە: خوایە حمە خدر بپارێزی، بەخوا زۆر پێش مەلابانگدان دەرچوو.

ئاوا: ئیشەڵڵا خوا ئەم مێردەیانت بۆ ئەهێڵێ هاهاها.

Cut

دیمەنی – ١٦٩٦ – ڕ/ د – بەر ئۆفیسی تیرۆژ:

(( باهۆز پاڵیداوە بە ئۆفیسەکەوە ))

باهۆز مۆنۆلۆژی ناوەوە:

ئای خوایە؟!!!! ئەوە ئەو کچە بۆ وا دواکەوت؟ تۆ بڵێی هیچی بەسەرنەهاتبێ؟ نا نا ئەوە چییە من هەر دڵم بەلای شتی خراپا ئەچێ؟ (( ڕامانی کەم)) کە جوان و خان و مانیشە خوایە.. جا با هەر جوان بێ، خۆ پیاو ناوێرێ قسەیەکی لەگەڵا بکا.. من بەم گیرفانە خاڵیانەوەو ئەویش (( تەماشای ئۆفیسەکەی ئەکا )) بەم هەموو تەنتەنەو عەنعەنەیەوە........... ئەرێ ئەوە چیتە باهۆز؟ ناخۆشت کرد.. ئەو وەک برای خۆی سەیرت ئەکا....

مۆنۆلۆژ تەواو:

(( پاش کەمێک ئەڕوا ))

_______________________ Cut ___________________________

دیمەنی – ١٦٩٧ – ڕ / ن – ماڵی دیدەوان:

(( لورەی سەیارەی ئاسایش ئەبیستریّ..دیدەوان و ساماڵ گویّ هەڵئەخەن))

دیدەوان: ساماڵ گیان ئەوە ئاسایش و پۆلیسە، نەک بۆ ئێرە هاتبن، با لە دەرگای ئەودیوەوە بڕۆین لە دوورەوە تەماشایان ئەکەین، ئەگەر بۆ ئێرە نەهاتبوون، ئەگەڕێینەوە.. خۆ هیچمان لە دەست ناچیّ؟

ساماڵ(( دەمانچە دەرئەهێنێت و میلی ڕائەکێشیّ)): نا نا کاک دیدەوان، بۆ ئێرە نەهاتوون.

دیدەوان: کوڕم لە دڵسۆزیت ڕائەبینم، بەڵام چەک بۆ ڕائەکێشیت؟ شەڕ لەگەڵ حوکمەتا ناکریّ (( لە دەرگا ئەدریّ.. شڵەژانی دیدەوان)) پێمنەوتی با زوو مشوری خۆمان بخۆین؟ بە دڵنیایی ئەوانن، ڕاکە با دەرچین.

ساماڵ(( دەمانچەکە ئەخاتە سەر ملی دیدەوان)): فەرموو پێشمکەوە ئەو دەرگایە بکەرەوە.. تۆ باوەڕ ناکەی چەند دڵسۆزم.. بەڵام دڵسۆزی بازرگانێکی تلیاک و پیاوکوژێکی وەک تۆ نا دیدەوان.. من دڵسۆزی ئەو خەڵکەم، کە هەموویان خزم و کەسوکاری نزیکی من و تۆن.. بەڵام تۆ ژەهری سپییان دەرخوارد ئەدەی.

دیدەوان(( سەرسوڕمان)): تـ تـ تۆ تۆ.. تۆ سەر بە حوکمەتی؟

ساماڵ: من سەر بە خەڵکم و ناهێڵم ژەهرڕێژێکی وەکو تۆ، لە پێناوی بەرژەوەندیی و چاوچنۆکیی خۆیا دەرمانخواردیانکا.. (( توڕە)) پێشمکەوەو دەرگاکە بکەرەوە.

(( دیدەوان بە هێواشیی پێشی ئەکەوێت و دەرگا ئەکاتەوە.. کۆژین و چەند ئاسایشێک کەللەپچە ئەخەنە دەستی دیدەوان و لە دواوە سواری پیکابەکەی ئەکەن.. ساماڵ تحیە ئەکات و بە سەیارەی خۆی دوایان ئەکەویّ))

کۆژین: دەستخۆش میران گیان.

Cut

دیمەنی – ١٦٩٨ – ڕ/ن – دوکانی جەبار نمەک سوێریی:

(( جەبار دانیشتووەو خدر بە پێیوە وەستاوە))

جەبار: فەرموو برا.

خدر: بەو ناونیشانەی " وای بشارەوە گۆڕهەڵکەنیش بۆی نەدۆزرێتەوە" هاتووم بۆ ئەمانەتەکە.

جەبار: بەڵام دیدەوان وتی وا زوو کەسی بۆ نانێرم.. سەیرە هاتووی!

خدر: ئێستا زۆرمان پێویستیی پێیەتی، کاک دیدەوان لە بوژاندنەوەی دڵە.

جەبار: کەی جەڵتە لێیدا؟

خدر: ئەمشەو.. ئێستا ئەو ئەمانەتەمان بدەرێ درەنگمە.

جەبار: پەلەت چییە؟ با منیش سەرێکی کاک دیدەوان بدەم و دڵنیاتر بم، ئەوسا لە خزمەتتایە.

خدر: دەی فەرموو زۆر درەنگە.. با بچین بۆ نەخۆشخانەش.

جەبار: ئەها ئەهـ وا خۆم کۆئەکەمەوە.

(( خۆی کۆ ئەکاتەوەو ئەچنە دەرەوە))

———— تابع ———— Cut ————

دیمەنی – ١٦٩٩ – متبوع – ڕ/ د – بەردەمی دوکانی جەبار نمەک سوێریی:

(( سەیارەی ئاسایش وەستاوە لە نزیکی دوکانەکە))

خدر: فەرموو با جارێ بچین بۆ ئەمانەتەکە، ئەوسا لە ئاسایش کاک دیدەوانیش ئەبینی.

جەبار: من هیچم نەکردووە.. وەک برادەر ئەو ئەمانەتەم بۆ پاراستووەو ناشزانم چی تیایەو تیانییە.

خدر: لای دادوەر قسەی خۆت بکە.. قسەکردنت لێرە بێسوودەو بێدەنگبە.. هەر کاردانەوەیەکیشت هەبێ لەسەرت ئەکەوێ.

(( ئەخرێتە دواوەی پیکابەکەو ئاسایشەکان سەرئەکەونەوەو خدر لە پێشەوە.. ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٠ – ڕ / د – بەردەرگای ماڵی مریەم:

Mute

(( کۆژین دێتە دەرەوەو چەند ئاسایشێک مریەم و سەمەدو کامیل کەللەپچە کراون و دێنە دەرەوە، ئەو سێیە ئەخرێتە پشتەوە، لەگەڵ دیدەوان دائەنرێن))

Cut

دیمەنی – ١٧٠١ – ڕ / د – چایخانەکەی کە ڕەوەز لێی دائەنیشێ:

(( ڕەوەزو ڕێبین و ڕێبوار دانیشتوون، ڕەوەز تەلەفون ئەکا.. ڕێبین کەمێک لێیانەوە دوورە نامە ئەنوسێت بە مۆبایل.. ڕێبوار لێی نزیک ئەبێتەوەو تەماشای دەستی ئەکا، ڕێبین بەئاگا دێتەوەو نامەکە ئەسڕێتەوە))

ڕێبوار(( دوای تەلەفونەکەی ڕەوەز)): ئەرێ کاکە ڕەوەز ئەم کابرایە نامەی بۆ دلێر ئەنوسی و لەولاوە تۆش قسەت لەگەڵ ئەکرد؟ ئەوە پێویستە وەک بزانی؟

ڕەوەز(( بۆ ڕێبین دێتە پێشەوە)): نامەی چیت بۆ نوسیوە گەلحۆ، ئادەی بزانم؟!

ڕێبوار: نەیهێشت منیش بیبینم، سڕیەوە.

ڕەوەز: باسی چیت بۆ ئەکرد؟ پێم بڵێ با شەقشەقێنی ئەم ناوەت پێ نەکەم!

ڕێبین: بەخوا گەورەم بۆ دلێر نەبوو، ئەم وایزانی نوسیومە دلێر.. بۆ کەپڵەکەم بوو ناوی دیدارە، حەزم نەکرد بیبینێ بۆیە سڕیمەوە.

ڕەوەز: جارێکیتر لەگەڵ منا بوویت نامەو نامەکاریی ناکەی، تێگەیشتی؟

ڕێبین: بەسەرچاو گەورەم ئەمرەکەیت.

ڕەوەز: ئەوە شتەکانیان وەرگرت، لەو دڵەڕاوکێیە ڕزگارمان بوو، ئینجا دڵەڕاوکێی گەیشتنەوەیان.

ڕێبوار: هیچ نابێ ئیشەڵڵا خۆ کاک زاهیدو تافان یەکەمجاریان نییە.

ڕەوەز: ئەبێ دەقە بە دەقە ئاگام لێیان بێ، لەهیچ شوێنێک ناحەوێمەوە.

ڕێبوار: من زۆر دڵنیام لە سەرکەوتنیان.

(( سەیارەیەکی ئاسایش دێتە بەردەمیان و زۆر بە گورجوگۆڵیی ئاسایشەکان دائەبەزن و دەوریان ئەگرن.. خدر دائەبەزێت))

خدر: ئەو دووە سەرخەن، (( بۆ ڕێبین)) هێمن تۆ لەگەڵ خۆما سەرکەوە دەستخۆش باوکە.

(( ڕەوەزو ڕێبوار بە سەرسامییەوە سەیری ئەکەن))

ڕێبین: خراپ تێمەگەن گەورەم، ئەو نامەیە بۆ دلێر بوو تا گەورەم بگاتە ئێرە.

خدر: دەستخۆش.

ڕەوەز: ساڵت بە هەزار چووبێ، ناهێڵم ئەمەت بەسەرەوە بچێ.

خدر(( پێکەنینی کەم)): بلێ ئەگەر خوا عومر باقی بدا، چونکە مان و مردن بەدەست خۆت نییە هههە.

(( سواری سەیارەکەیان ئەکەن و ئەڕۆن))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٢ – ڕ/ن – ماڵی نارەوەن:

(( نارەوەن و تریفەو تیرۆژو نیناو هەرمێ))

هەرمێ: ئینجا هەموویانی گرت، بەس شتێکی زۆر سەیرم بینی.. هەموو پۆلیسەکان بە کاکە پۆڵایان ئەوت گەورەم.

نارەوەن(( سەرسوڕمان)): چییییی؟

هەرمێ: بەخوا بەڕاستمە، بەویانی ئەوت ئەوەم بۆ بکەو بەویتری ئەوت بچۆ بۆ ئەوێ و کچێ هەر مەپرسە.

تریفە: ئای لە حەمەخدر!! دیارە زۆری لەژێر سەرایەو خۆی دەرنەخستووە.

تیرۆژ: بەخوا هەر بە ماتە ماتەکەی، دایم لە دڵی خۆما ئەموت ئەم پیاوە، شتێکە.. بەڵام هەرچەندم ئەکرد نەمئەزانی چییە.

هەرمێ: ئیتر یەکسەر کە منی ئازاد کرد.. ئاخر پێشتر تەقەی لێکردن و کچێکی بریندار کرد، کە چوومە دەرەوە بینیم.. ئا ئیتر یەکسەر یەکێکی بانگ کردو وتی بیبە بۆ ماڵی نارەوەن خان.

تریفە: ئێ ئێ؟

هەرمێ: زۆرم حەز ئەکرد لەوێ نەهاتمایەتەوە.. کاکە پۆڵا نەیهێشت.

تریفە: یەعنی ناویشی حەمەخدر نییە؟

نارەوەن (( خۆ بەپەسەند زانیی)): ئا ئا دەمێکە ئەزانم ناوی پۆڵایە، بەڵام نەئەبووایە کەس بیزانێ.

تریفە: یەعنی ئەو چپەچپەتان باسکردنی ئەو شتانە بوو؟

نارەوەن: ئەی ئەبێ باسی من و ئەو چی بێ کچم؟ ئەرەوەڵا شت نەبوو نەیزانین، هەموو شتە نهێنییەکانی ئەو خەڵکە خراپانەمان دەست ئەکەوت و بۆ یەکمان باس ئەکرد.

تیرۆژ: ئیشەڵا تۆشمان لێ هەڵنەکەوی؟ شت نەبی و خۆت دەرنەخستبێ؟

نارەوەن: نا نا.. منی داماو چیم تا شت بم؟

تریفە: تۆ بڵێی لە مەترسیی ڕزگارمان بێ و بچینەوە سەر ئیشەکانمان؟

نارەوەن: ئیشەڵڵا! وا شوکر دەست کرا بە گرتنیان.. بەڵام بەخوا ئیتر من تاقەتی ئیشم نەماوە ڕۆڵە.. بۆ خۆم لەماڵەوە دائەنیشم و خەریکی ڕۆمان خوێندنەوەو سەیرکردنی دراما ئەبم.. ئیش بۆ گەنجێتیی خۆشە.

هەرمێ: لەخوا بەزیاد بێ تۆش هەر گەنج ماویتەوە دایە خان.. پیری چی؟ تۆ کوا پیری؟

Cut

دیمەنی – ١٧٠٣ – ڕ/د – دوو سەیارە لە دەشتاییەکی نزیک قەزایەک:

(( دوو سەیارەکە جیا ئەبنەوە هەریەکەو بەرەو لایەک.. دوو مەفرەزەی ئاسایش لێیان نزیک ئەبنەوەو لە هەوڵی ڕاکردنیشدا، هەردووکیان ئەگرنەوە.. یەکێکیان تافان و زاهیدو دلێری تیایەو ئەویتریش کابرایەکی کەشخەی بەتەمەن و سێ پاسەوان.. نەقیبێک لە سەیارەیەکی ئاسایشەکەدایە))

(( دایالۆگی گرتن و تەقەکردنی تێ ئەکەوێ))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٤ – ڕ/د – نزیکی گوندێک:

Mute

(( لەم دیمەنەشدا کۆمەڵێک ئاسایش بە دوو مەفرەزە، کابرای فرۆشیارو پاسەوانەکانی و سەیارەکەی سەرخێڵ و دوو گەنجەکە ئەگرن بە پارەو تلیاکەکەوە، دەرئەکەوێت سەرخێڵ سەر بە ئاسایشەکانە، پارچە کاغەزێکیان پێ نیشان ئەدا))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٥ – ڕ/ن – ژووری سەرکۆ:

(( خدرو سەرکۆ))

سەرکۆ: موقەدەم پۆلا کە ئەمڕۆ ئیشەکان تەواو بوو ، تەواوی ڕاپۆرتەکە بەرز ئەکەمەوە. بەڕاستی چالاکیەکی بێ وێنەی خۆتە.. نارەحەتیت زۆر چەشت.

خدر: گەورەم هەمووتان ماندوو بوون، نەقیب ڕاهۆزو ڕائید کۆژینیش وا هەر بەرێگاوەن، ئەزانی ئەوانیش چەند ماندوو بوون؟ ئەوە جگە لە کۆششی بەدەوامی جەنابت.

سەرکۆ: ئێمە هیچمان نەکردووە، بەو هیوایەی پلەتان بەرز بکرێتەوە بەرامبەر بەو هەموو ماندوویێتیی و دڵسۆزیی و چالاکییە گەورەیەتان.

خدر: خۆت ئەزانی من زۆر باکم بە پلەو پایە نییە گەورەم، باوەڕکە نەمئەزانی بووم بە موقەدەم تا جەنابت پێتوتم.. بەڵام ئەمزانی مووچەکەم باشەو پاداشتی باشیشم وەرئەگرت هاهاها.

سەرکۆ: شایانی زیاتریشیت.. لەو بڕوایەدای ئەمڕۆ کۆتاییان پێ بهێنرێ؟

خدر: ئەگەر هەڵەی تیا ڕوونەدا بەڵێ.

سەرکۆ: بەو هیوایە.. من تەلەفونم بۆ یاریدەدەرێتی ئاسایشی کۆمەڵگەی دەروازەکە کرد، کە هەر کەسێک بەو ناوەوە هاتە ناوەوە، بە باڵبەستکراویی بۆمان بنێرن.

خدر: دەستخۆش.. چۆن بوو شەنیا ئەوەی درکاند؟ هەهە.

سەرکۆ: ئەو نەیدرکاند، ژمارە تەلەفون و زانیاریی تەواوی کابرامان لە گوڵزارەکە وەرگرت، شەنیا هیچ نادا بەدەستەوە.

خدر: دواتر لە لێکۆڵینەوەدا دەرئەکەوێ چ تاوانبارێکی ترسناکە، گوڵزاریش لەو کەمتر نییە، بەڵام سەری گەورە دیدەوانەکەیەو نهێنی هەمووانی لایە.. گەورەم کەس ماوە لە فەرمانەکەی دادوەرا بهێنرێن؟

سەرکۆ: نا کەس نەماوە، کەمێک پێش تۆ ڕائید کۆژین تێلی بۆ کردم وتی تەنها هەوراز عارف و پشکۆ ماون، وا بەرەو لای ئەوانیش ئەچین.. بەڵام وتیان لە یەک دوویەکت داوە موقەدەم پۆلا.. خۆت ئەزانی یاسا ڕێگە بەوە نادا.. تەنانەت هەڕەشەی کوشتنیشت لێکردوون و وتووتە یاسا نوستووە، هەڵنەساوە جارێ. هههه

خدر: گەورەم ژیانی هەرمێی خوشکم لە مەترسیدا بوو، ئەوانیش وەک ئەوەی خاڵی لاوازیان قۆستبێتینەوە، نیازیان نەبوو نە شوێنی شەنیا بدرکێنن و نە هەرمێ.. هەرمێ خوشکی منیش نەبووایە، دڵنیابە نەناسراویش بووایە بۆ من، ئەوەم هەر ئەکرد، گرنگ ئەوەیە بە لێدانێکی کەم ژیانی هەرمێشمان ڕزگار کردو گەورەترین باندی ترسناکیشمان دەستگیر کرد.

سەرکۆ: بەڵێ زانیبووم، ژیانی هەرمێ بەرامبەر بەسەرکەوتنی بازرگانییەکەی شەنیا بووە.. بە هەرحاڵ تۆ زۆرترین شێوازی لێکۆڵینەوەت خوێندووەو ئەتتوانی بە ڕێگەیەکیتر شوێنەکانت پێ بدرکاندنایە.

خدر: هەرمێ ئەکوژرا گەورەم، شەنیاو ڕەگ و ڕیشەکەشی دەربازیان ئەبوو،

سەرکۆ: هەی ئافەرین کاکە پۆلا.. بە ڕاستی زۆر سەرسامم، سەرکەوتنی گەورەت بەدەستهێنا.. ئا.. کە دەستیشت کرد بە دوام، ئەتکەین بە بەڕێوەبەری بەشی لەناوبردنی ماددەی هۆشبەر.

خدر: نا گەورەم، خۆ تازە ئاشکرا بووم، ئیتر ڕێی کارکردنی نهێنیم لێگیرا، لە هەندێک سەرچاوەشەوە بۆنی گەرای تیرۆرم بیستووە، ئەچمە بەشی تیرۆر.

سەرکۆ: باشترین هەڵبژاردەیە موقەدەم هەڵۆ، سەرچاو.. ئیتر هیچ ئاسەوارێکی باندەکەی دارەوان و دیدەوان نەما.

مولازمێک ((دێتە ژوورەوەو تحیە)):.. گەورەم موژدە بێ دەست بەسەر هەموو لایەکدا گیرا، بە تلیاک و پارەو هەموو کەسەکانیشەوە.

سەرکۆ: پیرۆزە موقەدەم هەڵۆ، بە تایبەت لە تۆ پیرۆز بێ.. بەڕاستی گەورەترین پلانت هەبوو بۆ سەرکەوتن. ———————— Cut ————————

دیمەنی – ١٧٠٦ – ڕ / د – چایخانەکە:

(( چایخانەکە گەڕاوەتەوە شوێنەکەی خۆی.. هەندرێن لەفە ئەخوا ))

هاوڕێ: هەر ئەو چەند حەماڵەم دەسکەوت کاک هەندرێن، خۆ ماڵم ئاوا کردن بە جارێ هەموو ئاسایش دەرچوون، قەت بڕوام نەئەکرد ئەحە گێژ ئەوەندە ئازابێ.. دە وەرە وەرە ئەحەش ئاسایش بێ.

هەندرێن: ئەی ئەگەر وا خۆیان نیشان نەدایە، چۆن ئەو هەموو تاوانبارە گەورەیەیان پێ ئەدۆزرایەوە.

هاوڕێ: کورە ئەوەیان ئازایەتی عەقید هەڵۆ بوو، نازانم بڵێم عەقید هەڵۆ؟ یا عەقید حەمە خدر؟ بەخوا پلانی ئەوەندە تۆکمە بوو هەر مەپرسە.

هەندرێن: ئای!! چەند جار هەوڵی کوشتنی نارەوەن خانیان ئەدا، نەیانئەزانی سەری مارەکە خۆیەتی هههە ئەشهەدوو شایانی بەرزترین پلەیە.. ئەم وڵاتە دە پیاوی وای تیابێ، ئیتر باقیەکەی چی ئەکەن بابیکەن، خەڵک خەمی نامێنێ.

هاوڕێ: کاکە تۆ ئەزانی ئەو ژەهرە چەند پیسە کە ئەمانە خەڵکیان لەسەر ئەکوشت.. هەر بڵاوبووایەتەوە بەناو گەنجانا، ئیتر دەستت لە وڵات بشتایە، هیچی بەسەر هیچەوە نەئەما.

هەندرێن: ئەی چۆن؟ خۆمان حاڵمان زۆر جوان بوو ئەوەشی بهاتایەتە سەر.

(( دواتر ئۆفیسی تریفە نیشان ئەدرێ، تریفەی لێیەو ئارامە.. کۆمپانیای ئاوا دەرئەکەوێ لەتیف ئەچێتەوە ژوورەوە.. ))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٧ – ش / ن – ماڵی زوبێر:

Mute

(( خۆشیی و پێکەنین دەرئەکەوێ.. لەم دیمەنەدا ئەمانە دەرئەکەون:

زوبێرو نیگار، دەوران، نارەوەن، ئامۆ، ئاواو نینا، تریفەوخدرو هەرمێ، تیرۆژ، چیمەن و بروسک و مناڵەکەیان، ڕێژوان و سەلوا، هەندرێن و تافان و کڵپەو باڵا ))

Cut

دیمەنی – ١٧٠٨ – ش/ن – ژووری زیندانی ژنان:

Mute

(( بێتاقەیی و دڵتەنگیی دەرئەکەوێ.. لەم دیمەنەدا ئەمانە هەن:

(( مریەم، شەنیا، گوڵزار، ئارینا باڵی پێچراوە بە لفاف، لاوێن، دوو کچیتر))

Cut

دیمەنی – ۱۷۰۹ – ش/ن – ژووری زیندانی پیاوان:

(( بێتاقەتیی و دڵتەنگیی.. لەم دیمەنەدا ئەم کەسانە دەرئەکەون:

دیدەوان، عارف، هەوراز، ڕەوەز، ڕێبوار، پشکۆ، سەرچڵ، جەبار، ئەو دووەی کارتۆنەکانیان بۆ ڕەوەز لە کۆمپانیای ئاوا دەرکرد، ئەو سایەقەی ئەبووایە ئەردەڵان تایتەکەی بداتێ، زاهید، دوو گەنجەکەی دیدەوان ناردنی بۆ کوشتنی نارەوەن، سەمەد ، کامیل ، ئەو گەنجەی هاتە سەر کۆمپانیای ئاواو هەڵات واتە سالار، ئەو دوو گەنجەی لەبەردەمی دەلاکخانەکەی سەرچڵی لێ بوو لەگەڵ گوڵزار وەستابوون، نزیکەی ٨ گەنجیتر.))

Cut

دیمەنی – ١٧١٠ –ڕ/د – بەرماڵی تریفەو خدر:

(( خدرو تریفەو هەرمێ و ئاواو نینا بە جلی کوردییەوە وەستاون))

تریفە: ئامۆش دێت کە خۆشە.

خدر: خۆی وتی؟

تریفە: نا دایکم وتی وا گەیشتین، ئامۆشم لەگەڵە.

ئاوا(( سوعبەت)): ئەم دایکەم هەر ئەبێ دوابکەوێ، بە کۆمەڵ بۆ شوێنێک نەچووین و ئەو لە کاتی خۆیا ئامادەبووبێ هههە.

خدر: ئەو ژنە مەزنە ئاوا گیان، بۆ هیچ شتێک لۆمەی مەکە، هەڵبەت حیکمەتیک لە دواکەوتنەکەیا هەیە.. تەنها من ئەزانم چی بۆ ئێوەو بۆ من و بۆ خەڵک کردووە، ئەوە با بمینێ، ئەترسم باسی ئەو ئیشانەتان بۆ بکەم کە پێکەوە کردوومانن، باوەڕمان پێ نەکەن، بڵێن فشەیە هاهاها.

نینا: ئەوەی بۆ منت کرد، بە چاوی خۆم بینیم، هەرچی بگێڕیتەوە لەسەداسەد دروستە.

(( ئامۆو تیرۆژو نارەوەن بە جلی کوردییەوە دێن، دوای بەیانیی باش))

ئاوا: ئەوە بۆ زۆر دواکەوتن؟

ئامۆ: ئەی دایکم نییە؟ لایەکی بازاڕی پێچاوەتەوە، هێشتا ئەڵێ تۆ بڵێی کەم نەبێ؟ هههە.

خدر: چیم پێوتن؟ ئێمە بە هەرهەمووومان کیلۆیەک گوڵەبەڕۆژەمان نەکڕیوە.

تریفە: ئا توخوا گوڵەبەڕۆژەتان هێناوە؟

نارەوەن: کەسم بێبەش نەکردووە، هەرچیتان حەز لێیە هێناومە.

هەرمێ: بەخوا باوکم زۆر پێی ناخۆش ئەبێ بۆ وات کردووە دایە گیان؟

خدر: هیچ پێی ناخۆش نابێ، ئەترسم کەم بێ.

تیرۆژ: هیچ خەمت نەبێ کاکە حمەخدر.

ئامۆ: ئیتر حمە خدر نەما، پلەشی بەرزکراوەتەوە، عەقید پۆلا، تەواو.

خدر: دەی سەرکەون درەنگە وا نیوەڕۆیە، تا ئەگەینە لای باوکم پێی ئەچێ.

(( هەرکەس و ئەچێتە سەیارەی خۆیەوە.. سەیارەی ئاواو نینا، خدرو تریفەو هەرمێ، ئامۆو نارەوەن و تیرۆژ))

Cut

## کۆتایی